# کەمالنامە

## فەرهەنگی زانستی

## عەرەبی - ئینگلیزی - کوردی

دانانی

کەمال جەلال غەریب

چاپی یەکەم
کوردستان - سلێمانی
٢٠٠٣

ناوی کتێب : کەمالنامە    فەرهەنگی زانستی : عەرەبی - ئینگلیزی - کوردی
جۆر :    فەرهەنگ
دانەر :    کەمال جەلال غەریب
پیت چنین و مونتاجی کۆمپیوتەر : مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئەستێرە
چاپخانە :    چاپخانەی ڕێنوێن
بەرگ :    بەرگتێگری پەیڤین
تیراژ :    ١٠٠٠ دانە
ساڵ :    ٢٠٠٣
شوێن :    کوردستان    سلێمانی
ژمارەی سپاردن : ژمارە (١٢٤) ساڵی ٢٠٠٣ ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.

## پێشکەش:

- بە گشت لاوانی میللەتەکەم بە هیوای ئەوەی کە بەپێی توانا بەشێك لە کاتیان بۆ زانست تەرخان بکەن بە خوێندنەوەی رۆژنامە و کتێب و کۆڤاری زانستی هەمەجۆر ئەگەریش رێککەوت بە بەرچڤەکردنیان بۆ زمانی کوردی بۆ ئەوەی ئێمەش سامانێکی زانستیمان هەبێت بە کوردی.
- بەو کەسانەی کە لەو باوەڕەدان نەتەوەی کورد هەر خاوەنی چیرۆك و شیعر و بەیت و بالۆرەیە.

## تێبینی:

لەبەرئەوەی کە دانانی فەرهەنگ کارێکی گرانەو تەنها بە یەك کەس ناکرێت تکام وایە ئەگەر لە وشەکاندا کەموکورییەك یانە هەڵەیەك هەبوو زوو ئاگادارم بکەن بۆ ئەوەی لە چاپی تازەدا چارەسەریان بکەین وە بە بەردەوام ئەم فەرهەنگە دەوڵەمەند بکەین بە وشەی زیاتر و بە پێزتر ... شایانی سوپاسن.

# سـوپاسنامە

- زۆر زۆر سوپاسی تایبـەتی بـرازای خۆشەویستم دبەرهـەم ئەحمـەد ساڵح سـەرۆکی ئەنجومـەنی وەزیـران دەکـەم کـە لەماڵـەوە دیدەنـی کـردم و گـەلێك ستایشـی کـردم بـۆ دانـانی ئـەم فەرهەنگەو بڕیاریدا کە بەپێی توانا یارمەتیم بدات لە چاپکردنیدا .. ئـەوە بـوو کـە ئـەرکی تـەواوی (پیت چنین و لە چاپ دان)ی خستە ئەستۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان کـە ئەمـەش شایانی ڕێـزو شانازییە ..

منیش لە خودای مەزن داوا دەکەم کە نمونەی زۆر بێـت لـە پێنـاوی خزمـەت گـوزاریو لـە پێشخستنی باری زانستی میللەتەکەماندا.

- زۆر سوپاسی هەموو ئەو دۆستو برادەرانە دەکەم لە یەکەی ڕاگەیانـدنی سـەرۆکایەتی ئەنجومـەنی وەزیـرانو چاپخانـەی ڕێنوێـن/ بەڕێوەبەرایـەتی گشـتی توێژینـەوەو ڕێنمـایی کشـتوکاڵیو کۆمپیوتەری ئەستێرە کار دەکەن و ئەو مامۆستایانەی کە لە بەراوردو وردکاریدا هاوکاریان کردوم.

کەمال جەلال غەریب

نەورۆزی ٢٠٠٢ سلێمانی

# پێشەکی

فەرهەنگ واتە، قاموس - معجم Dictionary لە (Diction) یان (Dictio) بە مانای ووشە - Word یان قسەکردن (Speaking) لە زمانی فەڕەنسی و لاتینی‌یەوە وەرگیراوە.

فەرهەنگ کتێبێکی سەرچاوەیی‌یەو وشەو زاراوەی تیادایە بە شێوەی ئەلف و بێ، لە سەرەوە بۆ خوارەوە ریزکراون.

بەرامبەرەکانیشیان بەشێوەی‌و وشەی هاو واتا (مرادف) یان راڤەکردن بە هەمان زمان یان چەند زمانێکی تر تیادا، ریز کراون هەندێك جار زانیاریشیان تیادایە دەربارەی بنەڕەت‌و حینجە کردنی تهجئە Spell) وشەکان.

فەرهەنگ هەیە بچووکە چی لە ژمارەی وشەکانیدا (ژمارەیان کەمە) یان لە راڤەی وشەکاندا.

بۆ نموونە: ماء Water = ئاو، بەبێ ئەوەی ئاوەکە راڤە بکرێت ئەم جۆرە فەرهەنگە پێی دەوترێت: فەرهەنگۆك یان قاموسچە: وەکوو: فەرهەنگۆکی ئینگلیزیی کوردیی ئینگلیزیی، مامۆستا شاکیر فەتاح ١٩٣٤. فەرهەنگ هەیە وێنەدارە، فەرهەنگ هەیە وێنەی تیادانیە، وەکوو لە دواییدا باسیان دەکەین، کۆنترین فەرهەنگ کە نووسرابێت، فەرهەنگی (کالیماکی غراماتیکی گریکی) یەکەم سێ سەد ساڵ لەپێش زاییندا نووسراوە، ناوی (زەخیرە) بووە، پێشەواترین میللەت لە دانانی فەرهەنگدا چینی‌یەکان بوون، کە لە سەدەی (١١) هەمی بەر لە زاییندا،فەرهەنگێکی زمانەوانی‌یان داناوە(٤٠) هەزار وشەی تیادا بووە، ئەم فەرهەنگە لە لایەن (باونش) ەوە دانراوە، کونترین فەرهەنگی زمانەوانی لە لاتینیدا ناوی اللغە اللاتینیە (lingua-latina) بووە لە لایەن (وارۆ) وە دانراوە کە لە ساڵی (٢٨) ی بەر لە زاییندا مردووە ، بەڵام فەرهەنگی تەواوی زمانی یۆنانی لە ساڵی (٩٧٧)ی زاینییدا لە لایەن (یولیوس) بولکس) وە دانراوە، یەکەم فەرهەنگی عەرەبی (معجم العین) بووە، لە سەدەی دووەمی کۆچیدا لە لایەن (الخلیل بن احمد الفراهیدی) یەوە لەنێوان ساڵانی (٧١٨-٧٩١) ی زاینییدا دانراوە، کۆنترین فەرهەنگی کوردیی کە نووسرابێت فەرهەنگی (ئەحمەدی خانی‌یە) کە لە ساڵی ١٠٩٤ هـ دا بە شیعر نووسیویەتیەوە، لە عەرەبی‌یەوە بۆ کوردی‌و ناوی ناوە (نەوبەهار)، کە لە داوێنی فەرهەنگی (الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة) دا لە چاپدراوە: فەرهەنگ، واتە ، (المعجم = القاموس lexicon dictionary) بریتی‌یە لە چەند بەرهەمێکی سەرچاوەیی هەمە جۆرەی فراوان، بەڵام لە بنەڕەتدا بریتی‌یە لە لیستەی کۆمەڵە وشەیەك یان زاراوەیەك خۆیان‌و راڤەکانیان، دانانی فەرهەنگ پێی دەوترێت پیشەی فەرهەنگ دانان (الصناعة المعجمیة lexicography زانیاری وشەش (علم الکلمات - lexicolog)، فەرهەنگ بە پێی ژمارەی ماناکانیان دەکرێت بە چەند بەشێکەوە:

١- فەرهەنگی تاك زمان، أحادی اللغة monolingual لێرەدا دەبێت لیستەی وشەکان‌و راڤە کردنیشیان ، هەردووکیان بە هەمان زمان بێت، وەکوو فەرهەنگی خاڵ ، کوردیی- کوردی‌یە.

٢- فەرهەنگی جوتزمان (ثنائي اللغة = bilingual) وەکوو فەرهەنگی (هەنبانە بۆرینە) کوردیی فارسی‌یە لە لایەن مامۆستا هەژارەوە دانراوە.

٣- فەرهەنگی چەندینە زمان ( الکثیر اللغات polyglot) ، کە راڤەی وشەکان بە چەند زمانێکی تری جیاواز دەبێت.

٤- فەرهەنگی سێ زمان القاموس الثلاثي اللغات-Triple-Langage) وەکوو فەرهەنگی زانیاریی وێنەدار/ عەرەبی- ئینگلیزی- کوردیی/ دانەری کەمال جەلال غەریب.

٥- فەرهەنگی چوار زمان (Tetra lingual) وەکوو (معجم مصطلحات- التکنولوجیا الکیمیائیة)، عربي انکلیزی، فرنسی، المانی، تألیف:- الدکتور مهندس یحیی مصطفی العجماوي. المهندس محمود اسماعیل - طبع في جمهوریة المانیا الدیمقراطیة/١٩٧٤.

ئینسکلۆپیدیاش واتە کەڵە فەرهەنگ (الموسوعة = دائرة المعارف Encyclopedia ) جۆرێکە لە فەرهەنگ ، بەڵام وشەو زاراوەکانی یەکجار زۆرترن و بە دوورو درێژییەکی زۆرتر راڤەکراون، ئەمانیش بە پێی مادەکان چەند جۆرێکیان هەیە، وەکوو ئینسکلۆپیدیای جیۆگراف، ئینسکلۆپیدیای مەعدەنەکان.

The encyclopedia of The mineral-Kingdom

الموسوعة العربية الميسرة/ باشراف محمد شفيق الغربال عربي، عربي/ ۲۰۰۰ لاپەڕەیە.

لە فەرهەنگە بەناوبانگەکانیش بۆ نموونە:

١- فەرهەنگی گیاندارەکانی بەر لە مێژوو، واتە گیاندارە قڕتێکەوتووەکان:

Prehistoric animals نزیکەی (٩٦) لاپەڕەیە، ژمارەیەکی زۆری لە وێنەی ئەو گیاندارانە تیادایە کە بەر لە مێژوو ژیاون.

٢- فەرهەنگی وێبستەر WEBSTERS :

new collegiate dictionnry amerram webster copyright 1975

بریتیی لە (١٥٣٢) لاپەڕەو گەلێک خشتەو پاشکۆی زانستی تیادایە..

٣- فەرهەنگی :

Mc Graw-Hill Dictionary of SCIENTIFIC and TECHNICAL TERMS copyright 1978

**لە پێناوی دانانی ئەم فەرهەنگەدا :**

١- هەوڵم داوە کە زۆرترین وشەو زاراوە زانستی وەکوو ، کیمیا، فیزیا، بایۆلۆجی- کۆبکەمەوەو بەپێی ئەلفوبێ ریزیان بکەم.

٢- جاری وا هەیە، لە پاڵ وشە عەرەبییەکەدا دوو سێ هاوتام بۆ داناوە، بەپێی شێوەکانی زمانی عەرەبی بۆ نموونە:- الكزيما= قوباء.

انقليس- انكليس، حنكليس- جريث- قريث، ئەمانە هەموویان بەرامبەر ماس (نقە)ی کوردیی، یان لە بەشە کوردییەکەدا دوو سێ هاو ولتام بۆ ئەو وشە عەرەبییە نووسیوە، بۆ نموونە:

| بەشی عەرەبی | بەشی کوردیی |
|---|---|
| كثيراء - قتاد- عنزروت- قريجة - شرشير | کەتیرە، گەون، زونی، جونی، گۆنیی، چەقچەق |
| اصابع العروس- اظافر الجن-اظافر الشيطان | تولتاق، کەرویشکی. |
| هشلة البقر | |

٣- هەوڵم داوە کە وشەو زاراوەی کوردی تەواو بەرامبەر بە وشەو زاراوە عەرەبییەکان دابنێم.

٤- ئەگەر وشەو زاراوەی کوردیی تەواوم بەرامبەر بەو وشەو زاراوە عەرەبییانە نەدۆزییەوە، ئەوا پەنا ئەبەمە بەر وەرگێڕان یان بە کوردیی کردن.

٥- هەندێک وشەی زانستی بەناوی زاناکانەوەن وەکوو: وشەی (دهلية) بە عەرەبی Dahlia کە بەناوی رووەکزانی سویدی داهل (Dahl) وە ناونراوە. هەروەها وشەی : داروینیزم Darwinismکە بیروراو لایەنگرەکانی زانا Darwin دەگرێتەوە.

٦- وشەی مندلية (mendelism) پەیوەندی بە یاساکانی زانا مەندلەوە هەیە mendel لە زانستی کنێت (وراثة) دا.

٧- هەندێک لەناوی توخمە کیمیاییەکان ، کە بە کوردی هەن وەکوو خۆیان هێشتومنەتەوە وەکوو گۆگرد، زیو، زێڕ، ئەوانی تر بە ئینگلیزی.

- ئەو وشانەی کە بە پاشگری (Old ) کۆتاییان هاتووە بە مانای (نیمچە) دێن وەکوو:
- کریستالۆید Crystalloid واتە نیمچە بلوور، هەندێک وشەی ناو لەبەر باری پێویستی کراون بە سەرچاوە وەکوو لە (نایترۆجین)ەوە Nitrogen نترجە واتە نیتراندن Nitrification وەرگیراوە بە مانای گۆڕینی ئەوشادربۆنیترات یان تێرکردنی خاک بە خوێی نیترات.
- لە فۆسفۆرەوە phosphorous وشەی تفسفر- الوميض الفسفوري phosphore scence وەرگیراوە بەمانای شەوقدانەوە یەک کە لە ئەنجامی هەڵمژینی تیشکەوە پەیدا بووبێتو دوای وەستاندنەکەی هەتا ماوەیەک هەر بەردەوام دەبێت.

- لە وشەی فلورینەوە Fluorine ، تفلور - استشعاع Fluor scence وەرگیراوە، بە مانای دەرپەڕاندنی ڕۆوناکییەك كە لە ئەنجامی مژینی تیشكەوە لە سەرچاوەیەكی تردوە پەیدا دەبێت.
- لە وشەی كاربۆنەوە carbon كربنە یان تفحم carbonization وەرگیراوە بە مانای بوونە كاربۆن یان بوونە خەڵووز.
- گەلێك خشتەو پاشكۆی زانستییم خستۆتە ئەم فەرهەنگەوە وەكوو:-

١. خشتەی ئەستێرە گەڕۆكەكان.
٢. خشتەی ئەستێرەو كۆمەڵە ئەستێرەكان.
٣. جیهانی گیاندارەكان.
٤. جیهانی رووەك.
٥. لیستەی توخمە كیمیاییەكان.
٦. خشتەی گۆڕینی یەكە زانستییە هەمەجۆرەكان.
٧. ئەلفبای گریكی (یۆنانی).
٨. هیمای پێشگرو زاراوە زاانستییەكان.
٩. خشتەی خولی توخمە كیمیاییەكان.
١٠. لیستەی پێشگرو پاشگرەكان بۆ نموونە وەكوو پێشگری (-bio) وەكوو لە وشە biology دا بە مانای زانستی ژیان (علم الحیاة)
١١. پێشگری دینۆ(dino) بە مانای ترسناك مخیف وەكوو لە وشەی دینۆ سۆردا dino saurus دا كە گیاندارێكی ترسناكی قرتێكەوتووە.
١٢. پاشگری logy بە مانای زانین واتە علم وەكوو لە وشەی زانستی جیۆلۆجیدا geology واتە زانستی زەوی = یان زەویزانی.
١٣. پاشگری (-it is) بەمانای هەوكردن یان التهاب وەكوو لە وشەی:-
ئاڵوو كەوتن التهاب اللوزتین- Tonsillitis .

١٤- پاشگری (-gen) بە مانای پەیداكەر (مولد) وەكوو لە وشەی هایدرۆجیندا ( Hdrogen) بە مانای ئاو پەیداكەر.
١٥- هەندێك جار بۆ دڵنیایی زۆرتر، لە پاڵ ناوە ئینگلیزییەكاندا ، ناوە لاتینییەكانیشم بۆ گیاندارو رووەك نووسیوە وەكوو:-
كەرەوز/ كرفس/ common celery لاتینییەكەی: Apium graveo lenc
١٦- سوێسكە - حجل Partridge لاتینییەكەی cabis-graeca گێلاس = كرز - cherry لاتینییەكەی cerasus
پوشكە بە قنگە (جۆرە مێرووییەكە/ یعسوب- سرمان dragon Fiy ناوە لاتینییەكەی Libellviva.

**هۆیەكانی دانانی ئەم فەرهەنگە :**

ماوەی (٤٠) ساڵ ئەبێت كە پیشەی مامۆستایەتیم بۆ خۆم هەڵبژاردووە، ئەو پیشەیەی كە هەمیشە هەر شانازی پێوە ئەكەم، لەو ماوەیەدا لە هەموو پۆلەكانی قوتابخانە ناوەندیو ئامادەییەكاندا وانەی زانیاری هەمەجۆرەم ووتۆتەوە، وەكوو : (سەرەتای زانیاری ، كیمیا، زیندەوەرەكان، تەندروستی، فیزیا، رووەك، گیاندار، بیركاری . هتد).

بە زۆری لە ناوچەی كوردەواریدا زۆرجار تووشی گیروگرفت هاتووم لەبەر ئەوەی كە قوتابییەكانم بە باشی لە وانەكان نەئەگەیشتن چونكە وانەكان بە زمانی زكماكی خۆیان نەبوون، وە بۆ ئەوە ناچار ئەبووم كە بگەرێم بە شوێن زاراوەی زانستیدا (المصطلحات العلمیة).

هەر لەبەر ئەوە تەماشای زۆربەی ئەو فەرهەنگانەم كرد كە پەیوەندییان هەبووە بە زمانی عەرەبی یان كوردییەوە كە لەوەپێش چاپكرابوون، هەروەها پرسیشم لە رۆشنبیرانو خاوەن پیشەو پسپۆرەكان ئەكرد، لە ئەنجامدا نیمچە گەنجینەیەكم بۆ خۆم خست.

ئەوەبوو بەیانی (١١) ی ئازاری پیرۆز ئاواتی گشت دڵسۆزانی کوردی هێنایە دی، کە یەکێك لە بەندەکانی ئەوەیە: خوێندن بەرە بەرە لە قوتابخانە ناوەندیو ئامادەیی‌یەکاندا ببێت بە کوردی.

وە بۆ چەسپاندنی ئەو هەنگاوە شتێکی ئاشکرا بوو کە کتێبە عەرەبی‌یەکانی قوتابخانەکان وەردەگێڕێنە سەر زمانی کوردی لەبەر ئەوە پێویستی‌یەکی زۆرمان ئەبێت بە فەرهەنگێکی زانیاری ڕێكو پێك، کۆڕی زانیاری کورد بڕیاری لەسەر بدات بۆ ئەوەی کە لیژنەکانی وەرگێڕان سوودی لێ وەربگرن بەتایبەتی لە وەرگێڕانی کتێبەکاندا جگە لەوەش کە ئەڕوانینە میللەتانی سەر زەوی ئەبینین کە هەندێکیان وا گەیشتنە مانگو خەریکن بەرەو ئەستێرەکانی تر ئەڕۆن، وە هەمیشە هەوڵ ئەدەن بۆ ئاسانکردنی کاروباری هاتوچۆکردن بەناو بۆشایی دەوری خڕۆکی زەویدا، وە هەندێکی تریشیان هەر خەریکن بە ناخی دەریادا ئەچنە خوارەوە بۆ ناسینو سوود وەرگرتن لە گیاندارو رووەك، دەرمانو دەریا، رۆژ بەرۆژ خواردەمەنیو جلو بەرگو کەرەسەی خانوو، دەرمانو هۆی حەواندنەوەو تازەیان تازەتر دادەهێنن، ئێمەی کوردیش لەناو چەقی ڕێگەدا وەستاوین فریای ئەوە ناکەوین تەنانەت دۆزینەوەو داهێنراوەکانی میللەتانی تر بژمێرین، بەڵام دوور نی‌یە کە میللەتی کوردیش بە هەوڵو تەقەلای گشت دڵسۆزەکانی ڕێ ڕەوی زانستی بگرێتو بگاتە ریزی میللەتە پێشکەوتووەکان.

جا لەبەر ئەوە بڕیارمدا کە ئەم کۆمەڵە زاراوە زانستی‌یانە بخەمە شێوەی فەرهەنگێکەوە ئەویش ئەم فەرهەنگەیە کەوا لەبەر دەستتاندایە.

وشەی زاراوەی عەرەبی‌یەکانم بە پێی جۆری زانستی‌یەکان جیا کردوەو هەر یەکەی نیشانەی خۆیم بۆ داناوە بۆ نموونە :" کیمیا ك فیزیا- ف، حیوان ح .. هتد".

ئەگەر وشەی زاراوەی زانستی کوردی هەبوو بێت بەرامبەریان دام ناون، ئەگەر نەبوو بێت یان وەرمگێڕاونەتەوە سەر کوردی بە پێی بیروڕای خۆم، یان بەچەند دێڕێك روونم کردوونەتەوە ، یان وشەی زاراوە لاتینی‌یەکانم" واتە زانستی یەکانم" بۆ داناونەتەوەو خستومنەتە ناو دوو کەوانەوە، من وای دانانێم کە ئەم کردارەم لە هەموو روویەکەوە تەواوە، بەڵکە بە پێچەوانەوە، چونکە کرداری هیچ مرۆڤێك بە تەنها، تەواونییە، وە لە کەموکوڕی بەدەر نییە، جگە لەوەی کە دەریای زانستی هەرگیز لەبن نایەت.

لەبەر ئەوە تکا لە هەموو رۆشن بیرانو پسپۆرانو خوێندەوارە بەڕێزەکان ئەکەم کە بە چاوی بێ لایەن سەیری ئەم فەرهەنگە بکەنو لێی بکۆڵنەوە وەچی کەمو کوڕی‌یەکی تێدا ئەبینن لەمەر بارێکەوە بێت خێرا بە دەمی یان بە نووسین ئاگادارم بکەن، بۆ ئەوەی کە بە شانازی‌یەوە چارەسەری بکەم لە چاپی دووەمدا، چونکە ئاشکرایە کە خوێندەوار باشتر هەڵەو کەمو کوڕی ئەدۆزێتەوە وەك لە دانەر، بەتایبەتی تکایان لێ ئەکەم ئەگەر وشەی زاراوەی زانستی ئەزانن بەرامبەر وشەی زاراوە عەرەبی‌یەکان با بۆم بنێرن بەمەر شێوەیەك بێت لە شێوەکانی زمانی کوردی ئەگەر وشەیەك یان زاراوەیەك جێگەی تەواوی خۆی نەگرتووە ئاگادارم بکەن، جگە لەوەی کە هەندێك وشەو زاراوەی عەرەبی تیایە کە تەنیا بە چەند دێڕێك روونم کردوونەتەوە، چونکە وشەی زاراوەی کوردیم دەست نەکەوتووە کە دایان بنێم بەرامبەریان ، تکام وایە لەم رووەشەوە یارمەتیم بدەن، وە ئەم کردارە بە پێویستی‌یەکی نەتەوایەتی سەرشانی خۆیانی دابنێن بۆ ئەوەی کە بتوانین لە دوا رۆژدا فەرهەنگێکی زانستی فراوانتری بژار کراوە ( بەوێنەوە) دابنێین.

**تێبینی:**

(١) لەبەر باری ناهەمواری دەرامەت لە پێشتر نەمتوانی هەموو فەرهەنگەکە بەسەریەکەوە چاپ بکەم، بەڵکە تەنها سێ بەرگ نەبێت ئەویش بە یارمەتی کۆڕی زانیاری کورد کە زۆر زۆر سوپاسیان ئەکەم.

(٢) لەبەر ئەوەی کە وشەی ئینگلیزیم بەرامبەر هەندێك لە وشە عەرەبی‌یی‌کان دەست نەکەوتووە، هەندێك جار وشە عەرەبیو کوردی‌یەکانمان لەبەر گرنگی هێشتۆتەوە، بۆ ئەوەی کە لە کیسمان نەچن.

**مەبەستەکانم لە دانانی ئەم فەرهەنگەدا**

١- راکێشانی سەرنجی خوێندەواری کورد بەرەو زانستی ، چونکە ئیمڕۆ زانستی بریتی‌یە لە ژیان، وە ژیان بریتی‌یە لە زانستی.

٢- پێشکەشکردنی هەندێك زاراوەی زانستی بە وەرگێڕو قوتابی و خوێندەوارە بەڕێزەکان بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرن.
٣- بڵاوکردنەوەی زانستی‌یە بە هەموو جۆرەکانی‌یەوە لەناو میللەتەکەماندا.
٤- پڕکردنەوەی کەلێنێك لە کتێبی زانستی هەمەجۆرە لە کتێبخانەی کوردیدا.
٥- زانیاری زمان بنچینەی هەموو زانیاری‌یەکانە چونکە هۆیەکە بۆ تێگەیشتنی مانای وشەکان و زاراوەکان لەبەر ئەوە لە دێر زەمانەوە بیروڕای مرۆڤ بۆ ئەوە چووە کە فەرهەنگ دابنێت بۆ کۆکردنەوەی وشەو ماناکانی، بە هۆی دۆزینەوەو داهێنانی شتی تازەوە دانیشتوانی سەر خڕۆکی زەوی لە یەکتری نزیك بوونەتەوە ، گەرچی زمانەکانیشیان جیاوازبن، وە پەیوەندی ئابووری و بازرگانی و کۆمەڵایەتی لە نێوانیانا پەیدا بووە، لەبەر ئەوە پێویست وایە کە فەرهەنگ زۆر بێت، بۆیە منیش خۆم بە بەختیار ئەزانم کە ئەم فەرهەنگە پێشکەش بە خوێندەوارەکانی میللەتەکە بکەم، بۆ ئەوەی لە وەرگێڕانی کتێبی ئینگلیزی و عەرەبی قوتابخانەکاندا سوودی لێ وەربگیرێت.

ئیتر بەرەو دوا ڕۆژێکی ڕووناکترو ژیانێکی پڕ بەختیاری، کە ئاواتێکی بەرزی هەموو کوردێکی دڵسۆزە.

دانەر:

**کەمال جەلال غەریب**

**ئەندامی یەکێتی نوسەرانی کورد**

**ئەندامی یاریدەدەری کۆڕی زانیاری کورد**

**سەرپەرشتیاری پسپۆری / خانەنشین**

**ئەندامی پەرلەمانی کوردستان / خانەنشین**

**هەندێك پەند کە لەسەر فەرهەنگ نوسراون:**

هەر کەسێك ڕۆژێك لە ڕۆژان کتێبێك دابنێت لە ڕۆژی دووهەمدا ئەڵێت: ئەوەم لێ بگۆڕیبایە چاك بوو ، یان: ئەوەم بۆ زیاد بکردایە چاکتربوو، خۆ ئەگەر ئەوەم پێش بخستایە باشتر بوو وە ئەوەم لێ لابردایە جوانتر بوو، ئەمەش پەندێکی مەزنە، وە بەڵگەیەکە بۆ زاڵ بوونی هەست کردن بە کەموکوڕی بەسەر مرۆڤدا.

عیمادی ئەسفەهانی

ئەوەی کتێب دائەنێت بە تەمای ستایشە بەڵام ئەوەی فەرهەنگ دائەنێت ئەوەندەی بەسە کە لۆمە نەکرێت.

دکتۆر جنسن

# بانگەواز

بۆ هەموو زاناو پسپۆڕان‌و رۆشنبیران‌و ئەدیبانی کورد ...

بۆ ئەوەی میللەتی کورد جێگە پێی خۆی لە دواوەی کاروانی زانستی جیهانیدا بکاتەوەو بتوانێت باس‌و وتارو کتێبی زانستی‌و تەکنیکی بە کوردی دابنێت، یان وەریان بگێڕێتە سەر زمانی کوردیی. دەبێت فەرهەنگی زانستی‌یشی هەبێت، دەبێت زاراوەی زانستی هەبێت‌و بۆ ئەوەی زاراوەی زانستیشی هەبێت دەبێت دەزگایەکی فراوانتر بۆ ئەم مەبەستە لە کۆڕی زانیاریی کوردیدا هەبێت، دەزگایەك کە شوێن‌و کادیرو کتێبخانەی زانستی هەمە جۆرەو ئامرازی چاپکردن‌و دارایی . تایبەتی خۆی هەبێت چونکە وەکوو لە ئەنجامی تاقیکردنەوەی (٢٤) ساڵەوە بۆمان دەرکەوتووە کە کۆڕی زانیاری عیراق (دەستەی کورد) هەتا رادەیەکی کەم توانیوێتی بەم کارە پیرۆزە هەستێت، ئەم دەزگایەش لە رێگەی چەند لیژنەیەکی پسپۆڕەوە دەست بکات بە کۆکردنەوەی وشەو زاراوەی زانستی کوردیی کۆن‌و دانانی هینی نوێ، ئینجا لە سەر لاپەڕەی رۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکاندا یان بەشێوەی نامیلکە بڵاویان بکاتەوە، بۆ وەرگرتنی تێبینی‌و بیروڕاو رەخنەی رۆشنبیران، ئنجا لە رێگەی کۆنگرەوەو لەسەر رۆشنایی ئەو تێبینی‌یانە تەتەڵەیان بکاتەوە، لەبەر ئەوە زۆر تکا لە لێپرسراوەکانمان دەکەم لە هەموو وەزارەت‌و داەو دەزگا زانستی‌و رۆشنبیری‌و ئەدەبی‌و زانکۆ و قوتابخانە ئامادەیی یەکاندا کە هەر کەسە لە لایەنی خۆیەوە چاکی لاوێتی لێ هەڵبکات‌و هەوڵێکی بێ پایان بدات، بۆ هێنانە دی ئەم کارە پیرۆزەو بە ئەرکێکی نەتەوایەتی سەرشانی خۆی بزانێت.

بۆیە پێویستە پرۆسەی زانستی بکەین بە مەشخەڵێك لە ژیانی رۆژانەماندا ئەو بیروڕاو بنەمایانەمان بکەین بە بنچینەیەك بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ زانستیداو وای لێبکەین کە بچێتە ژێر رکێفی خۆمانەوەو هەوڵ بدەین کە زانستی پێش بخەین وە گەشەی پێ بدەین‌و زاناکان‌و نووسەرە زانستەکان هان بدەین بۆ پێگەیاندنی بەرەیەکی نوێ کە باوەڕی بە زانست هەبێت بۆ بەرژەوەندی میللەتەکەمان.

**کەمال جەلال غەریب**

**سلێمانی نەورۆزی ٢٠٠٣**

## کورتەیەك لە ژیانم:



- لە (١٩٢٩) ز لە شاری سلێمانی لە کوردستانی عێراق دا لە گەڕەکی کانیسکان لە نزیك پرۆژەی مایکرۆیفی ئێستا لە دایك بووم.
- قۆناغی خوێندنی سەرەتاییم لە ناوچەی قەرەداغو چوارتا، قۆناغی خوێندنی ناوەندیو ئامادەییم لە شاری سلێمانی تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٤٧ لە راپەڕینەکانی شاری بەغدا بەشداریم کردوەو گیراوم بۆ ماوەی (٣) مانگ، پاش ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر ئازاد کرام.
- لە ساڵی (١٩٤٨) دا لە کۆلێژی دەرمانسازی (الصیدلة) وەرگیراوم بەڵام بە هۆی باری سیاسییەوە بێبەش کراوم دوایی چوومەتە خانەی بەرزی مامۆستایان.
- ساڵی (١٩٥٢) بە پلەیەکی زۆر باش لقی زانیارییە سرووشتییەکانی (کیمیا) لە خوێندنگای مامۆستایانی بەرز (دار المعلمین العالیة) لە بەغداد تەواو کرد.
- لە ساڵی (١٩٥٤)دا بە هۆی بیروباوەڕی پێشکەوتن خوازییەوە گوێزرامەوە بۆ شاری بەسرە.
- لە ساڵی (١٩٥٩) دا بووم بە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئامادەیی کوڕانی سلێمانی.
- لە ساڵی (١٩٦٢– ١٩٦٩) بووم بە مامۆستای یەکەمی کیمیاو یاریدەدەری بەڕێوەبەری پەروەردەی سلێمانی.
- لە (١٤) ی رەمەزانی ساڵی (١٩٦٣) زیندانی کرام بۆ ماوەی (٤) مانگ پاشان هەر لە هەمان ساڵدا لە رەشبگیرییەکەی شاری سلێمانی لە حامیەی سلێمانی بۆ ماوەی (٣) مانگ زیندانی کرام.
- لە ساڵی (١٩٧١) دا بووم بە پسپۆڕی پەروەردەیی (کیمیاو زیندەوەرزانی) لە پارێزگای هەولێر بۆ سەرپەرشتی کردنی مامۆستایان لە هەولێرو سلێمانیو دهۆك.
- لە ساڵی (١٩٧٨) بە هەمان فەرمان گوازرامەوە بۆ سلێمانی.
- ساڵی (١٩٨٤) بە هۆی باری رامیاریو ناهەمواری کوردستانەوەو بە زۆر نەبوونم بە بەعسی خۆم خانەنشین کردووە.
- لە ساڵی (١٩٥٦) دا ژنم هێناوەو خێزانەکەم مامۆستا(ناجیە شێخ قادر) ە.

**ناوی منداڵەکانم:**

١- (تریفە) "کچە" ئێستا مامۆستای زانکۆیە پسپۆڕە لە رووەکزانیدا (علم النبات).

٢- (تانیا) ژمێریارەو لە سوید دادەنیشێت.

٣- (توانا) ئەندازیاری شارستانییەو خاوەنی (مەڵبەندی کومپیوتەری ئەستێرە)یە لە سلێمانی.

٤- (تارا) دکتۆرەو پسپۆرە لە نەخۆشییەکانی ژنانو هەناوییدا لە لەندەن دادەنیشێت.

٥- (دانا) ئەندازیاری ئاودێرییە لە سلێمانی.

پێش ئەوەی لە کۆلیج دەربچمو بە فەرمانبەر دابمەزرێم زۆر هاوین ئیشم کردووە، وەکوو چاودێری کرێکارانی رێگەوبان و هەڵژماریی لە فەرمانگەی نفووسدا، بەڵام دوای ئەوەی کە دامەزرام بە مامۆستا لە هاویندا، لە ماڵانو لە قوتابخانەکاندا، وانەی تایبەتیم وتۆتەوە.

نزیکەی (٤٠) ساڵ مامۆستایەتیم کردووە لە قوتابخانەکاندا.

لە ساڵی (١٩٧٧) تووشی نەخۆشی شەکرە بووم.

یەکجار گەشتم کردووە بۆ دەرەوەی وڵات (سوریا،تورکیا، بولغاریا، یۆنان)

لە ساڵی (١٩٩٢) ەوە هەڵبژێردرام بۆ ئەندامی یەکەم ئەنجوومەنی نیشتیمانیی کوردستان.

**چالاکی لە بواری کۆمەڵایەتیدا:**

- لە ساڵی ١٩٦٩ بووم بە سەرۆکی کۆمەڵەی هەرەوەزی مامۆستایان لە سلێمانی.
- (٣) سێ جار ئەندامی کۆنگرەی مامۆستایان بووم لە سلێمانی.
- یارمەتی زۆری کتێبخانەی (سلێمانی)م داوە بە گۆڤارو پەرتووکی زانستی، هەروەها هەوڵمداوە کتێبخانەیەکی گەورە بۆ خۆم دابمەزرێنم.

**چالاکی لە بواری رۆشنبیریدا:**

- لە ساڵی (١٩٥٤) ەوە ئەو ماوەیەی کە لە شاری بەسرە بووم بەشداریم کردووە لە دەرکردنی گۆڤاری (المثقف)دا.
- ئەندامی کۆڕی زانیاری کوردو یەکێتی ئەدیبانی کوردو کۆمەڵەی زانستی کوردییم.
- ئێستا خاوەنی ئیمتیازی گۆڤاری (سەردەمی زانست)م کە گۆڤارێکی زانستییەو دەزگای چاپ و پەخشی (سەردەم) لە سلێمانی دەری دەکات.

**سوپاس بۆ ..**

١- خێزانەکەم مامۆستا (ناجیە قادر) کە یارمەتییەکی زۆری داوم لە هێنانەدی ئەم فەرهەنگەدا بەوەی کە زۆر لە ئیشە تایبەتییەکانی خۆمی رادەپەڕاند بۆ ئەوەی من خۆم تەنها بۆ دانانی فەرهەنگەکە تەرخان بکەم.

٢- جگەر گۆشەکانم بیلبیلەکانی چاوم:

تریفە و هاوسەرەکەی باوکی لەیلان    تانیا و هاوسەرەکەی باوکی دیلان    توانا و هاوسەرەکەی دایکی میران
تارا و هاوسەرەکەی باوکی نەشوان    دانا و هاوسەرەکەی دایکی ژیر .

٣- بەڕێز باوکی (دیلان) کە لەم چەند ساڵەدا لە پاکنووس کردنی ئەم فەرهەنگەدا یارمەتی داوم و چەند نسخەیەکیش لە (فەرهەنگی گیانداران و فەرهەنگی رووەکە ئابوورییەکان و زاراوە زانستییەکان)ی بۆ چاپ کردم لە دەرەوەی وڵات.

| | | |
|---|---|---|
| ا-دفلي | Oleander | ژاله، ڕووەکی ژاڵە. |
| إئتلاف - انسجام | Harmony | تەبایی، ڕێکی زەوی. |
| اب | Father | باووك. |
| آب | August | گەلاوێژ، مانگی ئاب، ئاگستۆز "٣١"ڕۆژە، مانگی هەشتەمە. مانگی خەرمانانی کوردی. |
| ابابيل | | کاردە پەلە، تەرنەئەبابیلە غازی، جۆرە باڵندەیەکە. |
| اباجور | Lampshade | کلاو ڕۆژنە، دوکەڵ کێش. |
| اباكيم | Ratel | هەنگوێن خۆرە، مێروله خۆر، جۆرە گیاندارێکی شیردەرەی بێ ددانە. |
| اباض | Rope | پەت. |
| اباه | | جۆرە ماسییەکی دەریایی کەتەی ڕەنگینی بریسکەداریپانکەڵەیە. |
| ابان | Time | سەرەتا، وەخت، وەرز. |
| إباده | Destruction | قەلاچۆکردن، بن بڕکردن. |
| ابته | Anger | تووڕەیی. |
| إبتر | Tail less | کوڵ، بێ کلك. |
| إبتزاز - إختلاس | Peculation | دزین، پارەوەرگرتن بە فێڵ. |
| ابتايت - الاباتيت | Apatite | ئەپاتایت، بریتی‌یە لە مادەی کالسیۆم، فۆسفەیت بە شێوەی کریستاڵ لە جۆرە بەردێکی سروشتی‌دا. |
| ابتلاع | Deglutition | قووتدان، هەڵ لووشین، دابلاندن داهێنان. |
| ابتسامة | Smiling | بزە، زەردەخەنە. |
| ابتعاد | Discord | بشکوڕین، دوورکەوتنەوە |
| ابتدائي | Primary | سەرەتایی. |
| ابتدائيات | Protozoa | پروتوزوا، گیاندارە سەرەتایی‌یەکان وەکو ئەمیبا. |
| ابتدائيات سوطية | Flagellata | گیاندارە سەرەتایی‌یە قامچی‌دارەکان. |
| ابح - اجش - اجش الصوت | Hoarse | دەنگ نووساو، دەنگ گڕ، دەنگ گەورە. |
| ابخر - فاسد | Foulbreathed | دەم بۆگەن. |
| ابدال - تغيير | Substitution | گۆڕین. |
| ابداع | Creation | جوان کاری، شیرین کاری. |
| ابداية - ابدية | Everlasting | بەردەوامی، بێ کۆتایی. |
| آبدة - موحشي | Wild | دڕندە. |
| ابراز | Defection | دەرهاویشتن، فڕێ دانی هەندێك مادەی تلپە یان بێ کەڵك یان زیان بەخش لە لەشەوە بۆ دەرەوە وەکوو گوو میز. |
| ابرش - مبقع | Speckled | بەڵەك، بازوو، بازەڵە. بازك، شاڵ. |
| ابرص | Leprous | بەڵەك، بازوو، بازەڵە بازك، کوڵ. |
| ابرونية | Abronia | ڕوەکێکی بچوکە گەڵاکانی لە گورچیلە ئەچێت کوڵەکانی زەردو بۆن خۆشن. |
| ابراميس | Bream | جۆرە ماسی‌یەکە لە ڕەگەزی سووره ماسی. |
| ابراق ضوئي | Photo Telegraphy | (فوتو تیلیگرافی) ناردنی وێنە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بە ڕادیۆ. |
| ابريسم - حرير | Silk | هەورێشم، سوورمە، ئاوریشم. |

| | | |
|---|---|---|
| ابرة | Needle | دەرزی، دەرزیلە، چەلـێ. |
| ابرة الراعي | Stork Bill | شەمەدانی، دەنوکی لەقلەق، ڕووەکێکی کورتی تەمەن درێژە بە تۆو قەڵەم زیاد ئەکات، تۆوەکەی شاخی پێوەیە. |
| ابرة التطعيم | Syringe | شرینقە، دەرزی. |
| ابرة مغناطيسية | Magnetic Needle | دەرزی موگناتیسی، دەرزی ئاسن فڕێن، دەرزی قیبلەنما. |
| ابرة اللسع، ابرة السم | Vespa Sting | چزوو، زبانە. |
| ابرة الراهب | geranium | گیایـەکی تەمـەن درێـژە قەدەکـەی گـرێ گرێیـە، گوڵەکـەی پێنـج پەلکـە بەرەکەی قوتویەکی قاومیی‌یە وەکو دەنووکی هەبێ وایە. |
| ابريق | Pitcher | مەسینە، ئافتاوە لوولێنە، کەمۆڵە. |
| ابريق القهوة | | جەزوە. |
| إبريق زجاجي | Water jug | مەسینەی شووشە. |
| ابريق الشاي | | قۆری، چادان. |
| ابرلز | | پیسایی کردن. |
| ابرية، هبرية | Dandruff | کرێش، کرێشی سەر. |
| ابريز - ذهب خالص | Pure Gold | زێڕ، تەڵا، ئاڵتون، زێڕی پاك. |
| ابريل | April | گوڵان، نیسان، شەستە باران، هـەرمێ پشـکوان، مـانگی چوارەمـە، "٣٠" ڕۆژە، ئەبریل. |
| آبري | | گیایەکـە گەڵاکـەی سـپیی زیوییـە بـۆ ڕازاندنـەوەی باخچـەکان بەکاردێت، گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی زەردە. |
| ابرام | Confirmation | قایم کردن، بەستن. |
| ابزيم | Clasp = buckles | بەلەزوانە، بەرەزوانە، ئاوزوون، قۆپچەی نێرو مێ، قرتێنە. |
| ابصار | Vision | بینین، چاوکردن، هەست کردن بە ڕووناکی. |
| ابض | Ham | (هامسترینگ) ژێرەوەی ئەژنۆ. بن هەنگڵ. |
| ابط | Arm Pit | بن دەست، بن باخەڵ، بن هەنگڵ، بن کەفش. |
| ابط النبات | Axilla | (ئەکسیلا) گۆشەی نێوانی گەڵا و لقەکەی |
| ابعاد | Abduction | دوورخستنەوە. |
| ابق | Abaca | (ئەباکا)، گوش گیایەکی بەرزی گەڵا پانە بەرەکەی زەردە لە قەدەکەی جۆرە ریشاڵێك دەرئەهێنرێ بۆ دروست کردنی گوش. |
| ابقار | Bovine=chattie | مانگا، ڕەشە ووڵاخ، چێڵ. |
| ابقع | Plebald | پەڵە پەڵە، پنکە پنکە. |
| ابكم - اصم | Mute | لاڵ، بێ زمان. |
| ابل - بعير | Camel | ووشتر. |
| ابلاغ | To Inform | ڕاگەیاندن. |
| ابله | Imbecile | گێژ، گەمژەل، حول، حەپۆل، وور، کەودەن، دەبەنگ، پلەی زیرەکی لە ٢٥-٥٠٪ گەوج، کەمژە گێل، مێشۆ. |
| ابله | Bull of burn | بلۆقی سووتاوی |
| ابلق | Plebald | بەڵەك، شل، بازك، بازوو. |

| | | |
|---|---|---|
| ابلق | Chat | کاسەڵە، سوێسکە، باڵندەیەکی بچوکی باڵ درێژی کلک خڕە لەسەر کـرم ئەژی هێلکەکەی شینی مەیلەو سەوزە. |
| ابلوج | Sugar Candy | قەنە، قەندە، هەنگوینی شەکری قامیشی ووشك کراوە. |
| ابلیا | Abelia | دەوەنێکی رازاندنەوەیە هەمیشە سەوزە، بەرزی (١-٢)م. گەڵاکانی سەوزەو لە پاییزدا سـوور ئـەبن، گوڵـەکانی وەك زەنـگ وایـە سپییە، بـە شـێوەی هێشوو، یەکی دوو گوڵی پێوەیە، بۆ پەرژین دەست ئەدات، بەقەڵەم و تۆو زیاد ئەکات. |
| ابلیس | Satan | ئەهریمەن، ئەهرەمەن، شەیتان. |
| ابلکاج | piywod | تەختەی تەنك، تەختەی موعاکەس. |
| ابن | Son | کوڕ. ڕۆڵە. |
| ابنة | Daughter | کچ. |
| ابنة | Gnaur | مێخەکە، بزماری پەنجە. |
| ابن الماء - مالك الحزين | Heron | شاهۆی سپی، جۆرە باڵندەیەکە. |
| ابن اوی | Jackal | چەقەڵ، تورك. تۆری، گەرە شاخ. |
| ابن حرام - ابن زنا | Bastard | زۆڵ، بیژی. |
| ابن عرس | Weasel | مشکی خورما، راسۆ، گیاندارێکە لە مشك ئەچێت لە زستاندا پێستەکەی سپی ئەبێت. |
| ابن عرس المنتن | Polecat | بۆگەنکە مشکی خورمای بۆگەن، جۆرە گیاندارێکە لە دەڵەك ئەچێت بەلام بچوکتر و درێژترە قاچی کورتە گوێچکەی زۆر بە دەرەوە نییە، رەنگێکـی بـۆری خۆڵەمێشـی هەیـە، هێڵـی رەش و زەردی تێدایـە، لەشێکی لاکێشەیی هەیە پشتی زەردو ژێـر سـکی سپییە مریشك و کۆتر ئەخوات. |
| ابن مقرض | Ferret | جۆرە گیاندارێکە لە مشکی خورما ئەچێت بۆ ڕاوکـردن بەکارئەهێنرێت رەنگی سپی مەیلەو زەردە، مشك و چۆلەکە ئەخوات. |
| ابنوس | Ebony | ئیبونـی، عەبـەنووس، ئەبـەنووس، درەختێکـی ناوچەگەرمەکانـە وەك دار گوێزوایە، گەڵاکەی لە گەڵای سنەوبەر ئەچێت، بەرەکـەی وەك تـرێ وایـە تەختەیەکەی ڕەش و ڕەق و بەنرخە. |
| ابهام | Thumb | پەنجە گەورە، پەنجەکەڵە، ئەسپێ کوژە، بەرانك، قامکە گەورە، تلیاکردی، کەڵەموست. |
| ابهر | Aorta | (ئورتا) پشت، شاخوێنبەر، گەورەترین بۆری خوێن بەرە، خوێن لە دڵەوە ئەبات بۆ لەش. |
| ابهق | Vitiligo | بەڵەك، بازوو، بازەڵە. |
| ابهل | Sabin | سەروی کێوی، عەرعەر، هەورێس، هەڤریسك. |
| ابهة | Grander = Pomp | تەنتەنە، کەشخە، مەزنی، شکۆیی، فەخفەخە. |
| ابو الخطاف | Kite | کۆلارە، کوڕ کورە. |
| ابو الرقص | Kingfisher | ماسی گرە. |
| ابو الركب | Foot and mouth disease | نەخۆشییەکی درمە ئەبێتە هۆی تاو ئازارێکی زۆر بە تایبەتی لە ئەژنۆدا، نەخۆشی پێی مەڕو مالات وولاخ. |
| ابو الزمیر | Pipefish | جۆرە ماسییەکە. |

| | | |
|---|---|---|
| ابو العفن - ابو المنتن | Zorll=Polecat | (پوليكات) بۆگەنكە گياندارێكى شيرەدەرى گۆشت خۆرى تسكەنى بۆگەنە چونكە بۆگـەنێك بەرئەداتـەوە بۆ دوور خستنەوەى دوژمن لە خۆى پێستەكەى بەنرخە. |
| ابو العيد | Lady bird | خاڵخاڵۆكە، جۆرە مێروويەكى بەسوودە چونكە مێروى تر ئەخوات. |
| ابو المدلج | Hedgehog | ژيشك، ژوژو. |
| ابو براقش | Common bullfinch | (كۆمۆن بوليفينچ) باڵندەيەكى بچووكە لە چۆلەكە ئەچێت پەڕەكەى بۆرە ناوەڕاستەكەى سوورە ژێرەوەى ڕەشە. خۆى كيف ئەكاتەوەو ڕەنگاو ڕەنگ دەرئەكەوێت. |
| ابوبرجيس | | دەرەختێكى دڕكاوىيە گوڵەكەى پەمەيىيە. |
| ابو بريص | Gecko | (جيكـو) مارمێلكـە، سـەرمازەڵە، شـەوگەرد، قومقومۆكـە، بيلەكـەرە، مـار ماروشك، ويزويزە، پيس پيسوك، جۆرێكە لە مارمێلكە. |
| ابو بوز | Garfish = halfbeak | جۆرە ماسىيەكە. |
| ابو جراب | Pelican | سەقاقوش، جۆرە باڵندەيەكە. |
| ابو جلمبو، ابوجنيب | Crab | (كراب) قرژاڵى ڕووبار، قرژانگ، قرژانگى ڕووبار، چنگار، خەرچنگ. |
| ابو جنيب ازرق | Blue crab | قرژاڵى شين. |
| ابو جنيب ذوقوقعة | Shelled carb | قرژاڵى قاقلەدار. |
| ابو حبيب | Sectretary bird | مايينى شەيتان، جۆرە هەڵۆيەكى ناشرينە. |
| ابو حديج | Stork | حاجى لەقلەق، لەقلەق. |
| ابو حراب | Oryx | مانگا كێوى. |
| ابو خريان | Chicken Pox | مێكوتە. |
| ابو خضير | Bee eater | خەنجەر بالآ، كەنسمە، جۆرە باڵندەيەكى هەنگ خۆرە. |
| ابو خيجة | Liver fluke | پەپوولە،كرمى جگەر. بەزۆرى تووشى مەڕو ماڵات ئەبێت. |
| ابو دخنة | Reed warbler | باڵندەيەكە ڕەنگەكەى لە ڕەنگى كلاوكورە ئەچێت. |
| ابو دميم | Canary grass | گياكانارى. |
| ابو دقيق | Butterfly | جۆرێكە لە پەپولە، مۆرانە. |
| ابو ذقن | Aard vark | بەرازى زەوى، چەناكەدار، گياندارێكى شيرەدەرى ئەفريقايى مێروولە خۆرە. |
| ابو ذهب | | گياندارى زێڕى. |
| ابو ذويل | | گيا ڕيشە، گيايە بە ڕيشە. |
| ابو ذنيبة - شرغوف | Tadpole | سەرەمێكوتە. بەچكەى بۆق. |
| ابور | Glutton | تێرنەخۆر، زۆرخۆر، چلێسى. |
| ابو زريق | Common jay | (كۆمۆن جاى) بۆرەك، جۆرە باڵندەيەكە پەڕەكەى شەرابى و كلكى ڕەشە، باڵەكـەى پەڵـەى سپىى پێوەيـە، دەنووكـى و قـاچى قاوەيىيـە لـە قەلەرەشـكە ئەچێت، لە چۆلەكە گەورەترە. |
| ابو زقاية | Black Bird | چێشكە، جۆرێكە لە چۆلەكە. |
| ابو زلة | | جۆرە باڵندەيەكە لە مراوى ئەچێت، ملى درێژە، سەرى قاوەيىيە سنگى سپىيە. |
| ابو سريع | Tinder | پووشوو، كۆڵە زوانە، پيفو، خەركۆڵ، قاو "بۆ ئاگركردنەوە" |
| ابو سعن | Marabou | (ماربو) سەقاقوش، جۆرێكە لە حاجى لەقلەق. |

| | | |
|---|---|---|
| ابو سولع | Oryx | مانگا کێوی. |
| ابو سوم | Opossum | (ئۆپۆسۆم)، گیاندارێکی ئەمریکی توورەکە دارە لەمشك ئەچێت، لەکاتی مەترسی دا بەدرۆ خۆی ئەمرێنێ. |
| ابو سويف | Hordeum | گزرەگیا، جۆ کێویلە، ڕووەکێکە لە جۆ ئەچێت، بۆ ئالیکی ئاژاڵ بەکارئەهێنرێت. |
| ابو سويف | Swordfish | شیرە ماسی، ماسی‌یەکی زەریایی کەتەی لمۆز درێژە. |
| ابو شص | Angler | ماسی‌یەکی دەریایی قولابدارە، سەرێکی زل و دەمێکی پانی هەیە. |
| ابو شوارب | Barbel | (باربڵ) جۆرە ماسی‌یەکە، سمێڵە. |
| ابو شوارب | Caesal Pinia | (سیالپینیا) ڕیشی مەلیك، درەختێکی بچکۆلەی جوانە، گەڵاکانی ئەوەرێ، نزیکەی ٤م بەرز ئەبێتەوە، گوڵەکانی زەردن بەڵام ئەندامی نێرەکی‌یەکانی پەمبەیین وە لە گوڵەکە دێنە دەرەوە، وە گوڵەکانی بەشێوەی هێشوون، بەرەکەی لە فاسولیای سەوز ئەچێت. |
| ابو صريرة | Navel lemon | لیمۆی ترشی گەورە. |
| ابو صوف - ثعلب افريقي صغير | Fennec | (ڤینیك) جۆرە ڕێوی‌یەکی گوێ درێژە. |
| ابو صوي | Lapwing | جۆرێکی ناشرینە لە هەلۆ، مار ئەخوات |
| ابو طيلون | Abutilon | ڕووەکێکە لە ناوچە گەرمەکاندا ئەژی. |
| ابو طيط | Plover | (پلۆڤەر) زیقاوڵە، جۆرە باڵندەیەکی قەراغ ئاوە خێرا ڕا ئەکات. |
| ابو ظفر | Spurwinged- Plover | داوە کۆستە، باڵندەیەکە بەشی سەرووی سەری ڕەشە، پشتی سەری پەڕی پێوەیە وەك نینۆك وایە، ملی سپی‌یە. |
| ابو عمى | Mole | مشکە کوێرە |
| ابو عوف | Locust | نێرە کوللە |
| ابو فصادة -ام عجلان | Wagtail | کلك هەڵ سەنگێنە، کلك هەڵ تەکێنە، جۆرە باڵندەیەکە. |
| ابو فروة | Chestnut | کەستانە، شابەڕوو. |
| ابو قرن - ابو قران | Unicorn | (نارۆزڵ) (١) نەهەنگێکی دەریایی شاخدارە، (٢) باڵندەیەکی دەنووك زلە. |
| ابو فروة - مرغي | Ruddy shelduck | جۆرێکە لە مراوی سەرو پشتی سوورە، ملی تەوقێکی ڕەشی پێوەیە، شا پەڕەکانی سپی‌یە. |
| ابو قربة | Pelican | سەقاقوش، ابو جراب. |
| ابو قردان | Ibis | باڵندەیەکی ئاوییە پەڕەکەی سپی‌یە، دەنووکی کورت و زەردە. |
| ابو قويع | Lark | کڵاوکوڕە، سوفی‌یە قیتە، قازەڵاخ، شوان خەڵەتێنە، جۆرە کڵاوێنە. |
| ابوكرش | Big- Bellied | ووړگن، زگ زل، دەفزك، تەلێر. |
| ابو كعب - ابو كعيب | Mumps | ملە خڕێ، گوێ ڕەپانە، ئاوسانی لووی لێکی ژێر گوێچکە. |
| ابو مالك - الحزين | Heron | شینە شاهۆ. جۆرە باڵندەیەکە. |
| ابو مجرف | Shoveler | باڵندەیەکە لە مراوی ئەچێت بەڵام دەنووکی گەورەو پانە لە کەوچك ئەچێت، سەری سەوزی مەیلەو ئەرخەوانی‌یە پشتی ڕەشەو کلکی سپی‌یە. |
| ابو مركوب | Shoebill Stork | جۆرە باڵندەیەکی ئاوی‌یە لە حاجی لەقلەق ئەچێت بەڵام دەنوکی پانە. |
| ابو مطرقة | Hammer Head | چەکوشە ماسی سەگی دەریا، جۆرێکە لە ماسی کۆسە، سەری لە چەکوش ئەچێت. |
| ابو مقبص | Scissor Bill | باڵندەیەکە دەنوکی لە مقەست ئەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ابو ملعقة | Spoon Bill | باڵندەیەکی قەراغ ئاوە سەری دەنووکی پانەو لە کەوچك ئەچێت، کەوچکەمەل. |
| ابو مليح | True Falcon | مانۆڕەك، جۆرە باڵندەیەکە. |
| ابو مليح | | خواردەمەنییەکە لە نان و خەیار و پیاز و مەعدەنووس و ترشی سماق و ڕۆن و زەیتوون. |
| ابو منجل | Ibis | باڵندەیەکی قەراغ ئاوییە لە حاجی لەقلەق بچوکترە دەنووکی درێژو چەماوەیە لە داس ئەچێت. |
| ابو منقار | Garfish | گارفیش، گارپایك، جۆرە ماسییەکە. |
| ابو منشار، منشار | Saw Fish | سۆفیش، جۆرە ماسییەکی دەریایی هێلکەکەرە، هێلکەکەی لەسکیدا هەڵدێت، لمۆزی وەك مشار وایە، ماسییەیەکی درندەی ترسناکە. |
| ابو منقار البط | Duck Bill | دەنووکی مراوی، جۆرە گیاندارێکی شیردەری هێلکەکەرە - دەنوکە مراوی. |
| ابونايت | Ebonite | ئەبونایت، لاستیکی ڕەق. |
| ابو نقار | King Fisher | ماسی گرە، باڵندەیەکی بچکۆلەی جوانی دەنووك درێژە قاچ و کلکی کورتە، باڵی سەوزو پشتی شینە، سنگی سوورە کلاوێکی بەسەرەوەیە حەز لە ژیانی ئاوی ئەکات. |
| ابو هبيس | | ئیبۆهبیس، جۆرە ئەسپێکی قرتێکەوتووە زاناکان بەسەرەتای ئەسپی دائەنێن. |
| ابووثاب | Weasle | مشکی خورما، راسۆ. گیاندارێکی شیردەری گۆشتخۆرە. |
| ابو الأبرد | Tiger | پڵنگ. |
| ابو الاخضر | Wild pigeon | کۆترە کێویلە گاکۆتر، کۆتری دەشتەکی. |
| ابوالحناء | Red Breast | باڵندەیەکی بچووکە سنگەکەی سووری مەیلەو زەردە، بەرسنگ زەردە، بووکە سوورە. |
| ابی رياح | | هەڵمەکە، تورمتە، مشك گرك، مژگرك، باڵندەیەکی سووکەڵەی گۆشت خۆرە لە واشە ئەچێت بەڵام بچووکترە دەنووکی لە مقەست ئەچێت. |
| ابيكاك | Ipecac | ڕووەکێکە لە بەرازیل ئەڕوێ، ڕەگەکەی دەرمانێکی ڕشێنەرەوەیە. |
| ابيض | White | سپی، چەرمگ، چەرمو چوڕ. |
| ابيض مائل للزرقة | | بۆز، جون. |
| ابيضاني | Whity = whitish | سپی واشت، سپی کەڵە. |
| ابيضاض - تبييض | Whitening | سپی هەڵگەڕان، سپیبوونەوە. |
| ابيض الخارصين | Zinc White | توتیای سپی. زینکی سپی، بۆیەیەکە لە گرییسدا بەکاردێت. |
| ابيدياسكوب | Epidiascope | ئیپیدیاسکۆپ، جۆرێکە لە چرای تعلیمی (الفانوس السحري) بۆ وێنە گرتنی تەنی تاریك (کە ڕوون نەبێت) بەکارئەهێنرێت وەکوو وێنەیەك کە لەسەر کاغەزێك چاپ کرابێت. |
| ابينفرين | Epinephrin = Adrenalin | ئیپینفرین، هۆرمۆنێکە لەلایەن لووی سەر گورچیلەوە دەرئەدرێت و دەرمانێکە بۆ ووریاکردنەوەی ماسولکەی دل. |
| ابية | Galactocoele | ئیپیسیا، جۆرە دەرمختێکە لە کۆمەڵەی کاژ (صنەوبەر). |
| ابيجة - زهرة مايو | May Flower | مەی فلەوەر، گوڵە مایس گیایەکی شاخییە و گوڵێکی سپی ئەگرێ و هێلی پەمەیی تیایە. |

| | | |
|---|---|---|
| ابرية | Key Apple = Aberia | کیی ئەپڵ، کلیلە سێو، دەوەنێکی دڕکاوییە بۆ پەرژین ئەرووێنرێت و بەرەکەی لە هەڵوژە ئەچێت ڕەنگەکەی زەردەو تامەکەی شیرین و کەمێك ترشە. |
| ابيو | Marmalade Fruit | مارمالید فرووت، جۆرە درەختێکە بەرەکەی هێلکەیی و زەردە، کاکڵەکەی ووشکەو ئەخورێت. |
| ابيون | Apion | ئەپیۆن، جۆرە مێروویەکی بچووکە لە سن ئەچێت. |
| اتام - اتأم | Twins = Twin | دوو هاوزایی، هاوزایی، دووانە. |
| اتارية | Sirenia | ئوتاریا، کۆمەڵە گیاندارێکی شیردەری دەریاییە وەکوو گوێزەکەی دەریا و شێری دەریا. |
| اتاوة | Royalty = Tax | سەرانە، بەرتیل. |
| اتان-حمارة | Sheass | شی ئاس، ماکەر، دێڵەکەر. |
| اتباع | Satellites | دەستوپێ. |
| اتباع | Following | پەیڕەوی کردن، شوێن گرتن. |
| اتبرين | Atatrine | ئەتبرین، دەرمانێکە بۆ چارەکردنی لەرزوتا. |
| اتجاه | Direction | ڕێڕەو، ڕووەو، سیلە، ئاست، سەمت. |
| اتجاه الرياح | Direct of the wind | ڕێڕەوی با. |
| اتجاه افقي | Horisontal direct | ڕێڕەوی ئۆیی. |
| اتحاد | Union | یەکێتی. |
| اتحاد كيمياوي | Chemical-Combination | یەکگرتنی کیمیایی، یەکگرتنی دوو "یان" پتر مادەی کیمیایی بە ڕێژەیەکی کێشی جێگیر بۆ پەیداکردنی چەند مادەیەکی تازە. |
| اتربة قلوية | Alkaline earth | خۆڵە قلێییەکان، هەندێك ئۆکسیدی کانزاکانە کە نیشانەی قلیەیی‌یان تێدایە. |
| اترج = اترنج-كباد - ترنج - تفاح ماهي | Citron | (سیدرات تری، سیترۆن)، ترنج، کەبات، درەختێکە لە کۆمەڵەی نارنج (Citron) بەرەکەی زەرد و گرنج گرنجەو گەورەیە ئەکرێت بە مرەبا. |
| اتروبين | Atropine | ئەترۆپین، ئاوێتەیەکی ژەهرە لە ڕەگی ڕووەکێکدا هەیە پێی ئەووترێ (بیلادۆنا Belladonna) لە کاربۆن و هیدرۆجین و نیترۆجین و ئۆکسجین پێکهاتووە، بۆ سڕکردن لە پزیشکیدا بەکارئەهێنرێت وە هەروەها بۆ گەورەکردنی بیبیلەی چاو و کەمکردنەوەی ئارەق و لیك. |
| اتريكولاريا | | ئەتریکۆلاریا، گیا مێزەڵانە، ڕووەکێکە لە زەلکاودا ئەڕوێت، توورەکەی پێوەیە کەمێش و مەگەزی تێ ئەچێت، دائەخرێت و دێتەوە یەك و ئەوەمێش و مەگەزە هەرس ئەکات و ئەیخوات. |
| اتريوم | Yttrium | ئەتریۆم، کانزایەکە ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی "٣٩"یە، کێشی ئەتۆمی‌یەکەی "٨٨,٩٠٥"، کانزایەکی دەگمەنە. |
| إتزان ديناميكي | Dynamic balance | هاوسەنگیی دینامیکی. |
| إتزان - موازنة | Balance | هاوسەنگی، لەنگەرگرتن، سەنگینی. وەستانی تەنێك لەژێر کاری چەند هێزێکدا. |
| اتزان كيمياوي | Chemical balance | هاوسەنگیی کیمیایی. |
| لتساق الاصوات | Harmony sounds | تەرانەی دەنگ. |
| لتسوغة | Tsuga | تسوگا، درەختێکە لە کۆمەڵەی سنەوبەر، مادەیەکی زەمقی لەتەختەکەی دەرئەهێنرێ، پێی ئەووترێت بەلسەمی کەنەدا. |

| | | |
|---|---|---|
| اتساق الالحان | Arranged tunes | تەرانەی ئاواز. |
| اتفاق | Agreement | ڕێککەوتن، پێکهاتن. |
| اتقاد - مادة ملتهبة | Kindling | کڵپە کردن، داگیرسان، هەڵبوون. |
| اتكال | Reliance | خۆهەڵواسین، چەل و مل، پاڵ دانەوە. |
| اتلاف - تغيير | Spoiling | لەناوبردن، پاکۆکردن، بەرباد کردن، خاپوور. |
| آتل - قرد عنكبوتي | Spider- monkey | سپایدەر مونکی، مەیمونی جاڵجاڵۆکەیی. |
| اتومتر | Atmometer | ئەتمۆمەتر، پێوەری هەڵم - هەڵم پێو. |
| اتهام - تهمة - تهمة موجهة | Accusation | تاوان بارکردن، گومان لێکردن. |
| اتون | Furance | فیورانس، ئاگردانی گەرماو، توون، گڕ، گوڵخەن، کوڵخان. |
| اتومارية | Beets beetle | ئەتۆماریا، قالۆنچەی چەوەندەر. |
| اتول | Atoll | ئەتول، کۆمەڵە دوورگەیەکی شیلانی‌یە لە شێوەی ئەڵقەدایە. |
| اتيان - جلب | Bringing | هێنان، هاوردن. |
| اث - اثاث | Furniture | کەلوپەل، شتومەکی ناومال. |
| اثاب - تين البنغال | Banyan | بانیان تری، (فیکەس ئیندیکا)، هەنجیری بنغال، درەختی بانیان درەختێکی گەورەیە هەندێك لە لقەکانی شۆڕئەبنەوەو ئەڕوێنەوە مادەیەکی جەوی لە قەدەکەی دەرئەهێنرێت بۆ چەورکردنی مەکینە بەکاردێت، لە دوورگەکانی هیندی ڕۆژهەلات ئەڕوێنرێت. |
| اثار | Monuments | شوێنەوار. وەکو پەیکەرێك کە مابێتەوە. |
| اثارة | Agilation | وورووژاندن، خرۆشاندن، ئاژاندن، بەرپاکردن. |
| اثبات | Confirmation | سەلماندن، چەسپاندن، ساغکردنەوە. |
| اثبج - احدب | Humpbacked | پشت کۆم، قەموور. |
| اثر | Irace | ترێس، شوێن، پاشماوە، شوێنەوار، باستان. |
| اثر القدم | Foot Mark | شوێن پێ. |
| اثرغ | Sweet Lemonade | لیمۆی شیرین. |
| اثر قديم | Ancient monument | ئەنتی کویتی، باستان، پاشماوەی دێرین. کۆنینە. |
| اثرم | Edentated | بێ ددان، دەم پووچ. |
| اثري | Monumental | باستان ناس، زانای باستان، پاشماوە، دێرین. |
| اثغار | Dentation | ددان دەرهاتن، ڕووانەوەی ددان. |
| اثفية- اثافي | Firedog | سێ‌پا، سێ قۆڵە، سێ کوچکە، سێیێك. |
| اثكول | Panicle | لاسکی گوڵ، لاسکی بەر، لاسکی میوە. |
| اثل-طرفاء-عبل | Tamarix | تاماریکس، دارگەز، دارگەزم، دار و دەوەنێکە جاری وا هەیە "١٠م" بەرزئەبێتەوە، گەڵاکانی سەوزو باریك و تیژن و لە زستاندا ئەوەری بۆ ڕازاندنەوەو پەرژین و دژی ڕەشەبا ئەروێنرێت، دارەکەی بۆ سووتاندن بەکاردێت، تەختەکەی بە نرخە، نزیکەی "٢٠" جۆری هەیە. |
| اثلم | Blunt | کەل. واتە تیژ نەبێت. |
| اثلم الاسنان | Blunt tooth | ددان کەل، کەلەفیچ. |
| اثمار | Fruitification | بەردان، بەرهانین، بەرگرتن، هاتنەبەر، هێنانەبەر. |
| اثمان | Gilly Flower | شەوبۆ: گیایەکە گوڵەکەی بەشەو ئەگەشێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| لثمان | Ipomoea | ئیپۆمیا، بیبۆیدس، مالوێنچه مالۆنچه، گیایەکی خشۆکە لە کۆمەڵەی لاولاو. |
| لثمد - انتیمون | Antimony | ستیبیەم، ئەنتیمون، کل، بەردی کل. |
| اثنولوجیا | Athnology | ئـەثنولۆجی، زانیـاری ڕەگـەزەکانی مـرۆڤ، دەربـارەی ڕ موشـت و بڵاوبوونەوەیان. |
| اثنا عشری | Duodenum | ڕیخۆڵەی دوانزەگرێ، گورگان خواردو بەشی یەکەمە لە ڕیخۆڵە، شلاوی زراوو پەنکریاسی تێ ئەڕژێت (دیودینەم) |
| اثول - غبي | Dull | دەبەنگ. |
| اثیر | Ether | ئەثیر، جەوهەر، سپیهان، ئەسیر، ئیفر، نابوو، شتێکی درۆزنەیە کۆنەکان وای دائەنێن کەوا مادە نییە، بەڵام هەموو شوێنێکی داگیرکردوە بەتاڵ و نابەتاڵ، وە شـەپۆلی ڕووناکی و تیشك ئەگوێزێتـەوە، یـان شـلەیەکی بـێ ڕەنگی نەبینراوە هەموو بۆشایییەکی پڕ کردۆتەوە. |
| اثیر | Ethereal Atmosphere | ئیثیریـال ئەتمۆسـفیر، گوایـا مادەیەکـە کێشـی نییـە و کەوتۆتـە نێـوان تەنەکانەوە کە شەپۆل ئەداتەوە ئەبێتە هۆی گەیاندنی دەنگ و گەرمی. |
| اثیل | Ethyl | ئەثیل، ڕەگێکی ئۆرگانێکی کیمیایییە لە ئیثان وەرگیراو. |
| اجازة | Permission | وچان. ڕێپێدان . مۆڵەت. |
| اجازة مرضیة | Sick leave | وچانی ناساغی. |
| اجازة مرضیة | Sick leave | وچانی نەخۆشی. |
| اجازة دراسیة | School Certificate | وچانی خوێندن. |
| اجاج | Brine | تاڵاو، سوێر و تاڵ، گیراوەیەکی خەست لە خوێی چێشت لە ئاودا. |
| اجاج | Warm | تینی گەرما. |
| اجار اجار | agaragar | ئـەگار ئـەگار، مادەیـەکی لینجـە لـە قـەوزەی دەریـایی دەرئـەهێنرێ بـۆ پەروەردەکردن و زاوزێ پێکردنی باکتریا بەکارئەهێنرێت. |
| اجاص، انجاص | Plum | هەڵوژە، ئاڵوباڵو، حەلوك، حولیچکە، جەنانێر، ئەلوجە، ئەڵوژە. |
| اجاص اسود | Black cherry | هەڵوژە رەشە ئاڵو بوخارا. |
| اجاص اصفر | Yallow Cherry | هەڵوژە زەردە. |
| اجاص مطعم | Grafted plum | حەمەدەشێن، درەختێکی هەڵوژە کەلەگەڵ قەیسی متوربە کرابێت بەرێکی خۆشی ~~هەیە~~. |
| اجاص بري | Wild Cherry | هەڵوژە کێویلە. |
| اجاص شائك | Spiny Plum | هەڵوژە دڕکاویی، درەختێکی دڕکاوییە گوڵەکەی سپییە، بەرەکەی شینی مەیلەو ڕەشە. |
| اجاق - موقد - ذمیئة | Stove | وەجاخ. |
| اجانة | Wash basin | تەشت، سوێنەی جل شوتن. |
| اجباري – إلزامي | Obligatory | بەزۆر، بەتۆپزی. |
| اجتثاث - استاصال | To pull out = up root | لەبن دەرهێنان، لە بن دەرکێشان. |
| اجة-اجات | Sun flare | فل، فلێرز، تەقینەوەی ووزە لەسەر ڕووی خۆر. |
| اجترار | Rumination = ruminate | کاوێژکردن. وەکو لە گاو مانگادا. |
| اجتماع | Conference | کۆنفرانس، کۆبونەوە. |
| اجتزاز | To shear | بن بڕکردن، خوری بڕینەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| اجتهاد | Diligence | هەوڵ، تەقەللا. |
| اجدب | Barren | ووشکانی، وشك. |
| اجدل | Hawk | جۆرێکە لە هەڵۆ، هەڵۆ. |
| اجذم | Leprous | گول. |
| آجرة = آجريات | | ئەجیریا، مێرووی ڕووەك، مێروویەکە زیان بەدارو درەخت ئەگەیەنێت. |
| اجر | Hire= Wages= Fees | کرێ، مز، پاداشت. |
| اجرة يومية | Daily hire | کرێی ڕۆژانە. |
| اجر-اجرة | Tiles= Brikes | خشت، خشتی سوور. |
| اجرب | Scaby= ichy | گەڕ، گڕوێ. |
| اجش=اجشر | Hoarse=Harsh | دەنگ گڕ، دەنگ نووساو، دەنگ گەورە. |
| اجفال | To start | سڵ کردنەوە، سڵەمینەوە راچڵەکین، داچڵەکاندن، ڕاچەنین. |
| اجل | For | پێناو. |
| اجل - نعم | Yes | بەڵێ. |
| اجل | End of Life | مەرگ، مەودا. |
| اجم | Hornless | بێ شاخ، کۆڵ، ئاژاڵی، بێ شاخ یا کۆڵ. |
| اجماع | Unanimity | کۆمەك. |
| اجمة - غابة | Jungle | جەنگەڵ، بێشە چوخور، چوغورد. |
| اجمة القصب | Reed bed | قامیشەڵان، نەیزار. |
| اجمالي | General = total | هەموو، گشتی، تێکڕایی. |
| اجنترون | | ئیجنیترۆن، ئامرازێکی ئەلەکترۆنی‌یە بۆ گۆڕینی تەوژمی کارەبایی گەورە. |
| اجهاد | Stress | ستریس، ئەو هێزەی کە ئەکەوێتە سەر یەکەی ڕووبەر. (٢) ماندوکردن، رەتاندن، شەکەتکردن. |
| اجهاض | Miscarriage = abortion | لەبارچوون، لەبارخستن، بەرفڕێدان. |
| اجهاض "للحيوان" | Abortion | بەرلویتە، بەراویتەبوون. |
| اجهاش البكاء | Point of weeping | قوڵپی گریان. |
| اجهر | Day Blind | ڕۆژ کوێر، کەسێك کە بە ڕۆژ چاوی نەبینێت. |
| اجوانا | Iguana | ئیگوانا، گیاخۆرە، جۆرە مارمێلکەیەکە لە دارستانە گەورەکانی ئەمریکا ئەژی لە کەناری دەریاکان، ڕەنگەکەی سەوزە، درێژییەکەی مەترو نیوێك ئەبێ پێستەکەی دڕکاوییە |
| اجوانا الخرتيت | Rhinocerous iguana | ئیگوانای یەك شاخە، جۆرە مارمێلکەیەکە سەری لووتی شاخی پێوەیە. |
| اجوانا بحرية | Sea Iguana | ئیگوانای دەریایی، مارمێلکەیەکی دەریایی‌یە درێژی مەترێك دەبێت. |
| اجود | Better | باشتر. |
| اجوريادة | | درەختێکە لە بەرازیل، توێکڵەکەی بۆ "تا" بەکارئەهێنرێت. |
| اجوف | Hollow | پووت، پووچ، کلۆر، ناوپۆش، بۆش، پووچەڵ پووتەڵ، پووچەك ناوبەتاڵ. |
| اجيج | Blazing | بلێزینگ، سووتانی ئاگر بە گڕێکی سپی، کارلێك کردنێکی کیمیایی‌یە گڕ و گەرمی پەیدا ئەکات. |
| اجيج | Incandescence | گەرمترین ڕۆژانی هاوین، چلەی هاوین. |
| اجير | Paid | کرێکار. |

| | | |
|---|---|---|
| احاثة | Paleontology | پاليونتۆلۆجی، پاليئنولوجی زانياری ئەو گياندارو ڕووەكانەی كە بوون بە ژێر زەوييەوەو بوون بە بەرد. |
| احاد | Digits | يەكان. |
| احادی | Mono | تاك. |
| احادی الذرة | Mono atom | تاك ئەتۆم. ئەو موليكيولەيە كە تەنـها لـە يـەك ئـەتۆم پێكـهاتووە وەكـوو ئەتۆمی هيليۆم. |
| احادی الخلية | Monoplastid | تاك خانە. |
| احادی التكافؤ | Monovalent | تاك هاوهێزی، تاك ڤاليەنسی، سيفەتی ئەو ئەتۆمەيە كەيەك ئەلەكترۆن وون ئەكات يان وەرئەگرێت. |
| احادی المحور | Mono axle | تاك تەوەرە، تاك دۆخ. |
| احادی المسكن | Monocious | تەنيا ماڵ، يەك خانە. تاك ماڵ. |
| احادی الجنس | Monosex | تاك ڕەگەز. |
| احادی الظلف | Monohooted | يەك سم، تاك سم. |
| احادی القطب | Monopole | يەك جەمسەر (يەك پۆل)، يەك پيتە. |
| احاطة | Surrounded | گەمارۆدان، ئابلۆقەدان، دەورگرتن. |
| احافير-متحجرات | Fossils | فۆسيلەس، پاشماوەی زيندەوەری بەبەردبوو لەناو چينەكانی زەويدا. |
| اح-اح البيض-احين | Albumen | ئەلبۆمين، سپێنەی هێلكە. |
| احبن | Big- bellied | زگ زل. |
| احتباس البول | Retention opurine | ميز گيران، ميز جەڕان، بەهۆی تەسكی بۆری ميز و ئاوسانی پرۆستات و دومەڵ و بەردی ميزەڵدانەوە ئەبێ. |
| احتجاب الكواكب | External Burning | سوتانی دەرەكی، ئەستێرەگيران. |
| احتجار | Stone Cutting | بەرد هەڵكەندن لە كانە بەرد. |
| احتراس | Carefully | وورياببوونەوە، ئاگاداری كردن. |
| احتراق | Burning | سووتان، چزان. |
| إحتراق خارجي | External Burning | سووتانی دەرەكی. |
| احتراق داخلی | Internal Burning | سووتانی ناوخۆیی، سووتانی ناوەوە. |
| احترام | Respedt | ڕێزگرتن. |
| احتشاش - حصاد | Reaping | دروێنە، دوورينەوە. |
| احتضار | Expiration | ئاوزيينگ، ئاويلكە، گياندان، گيانەڵا. |
| احتضان | Embracing | گرتنەباوەش، لەباوەش گرتن، كردنە كۆش. |
| احتضان البيض، ترخيم | Hatch=hatching | هـاچينگ، كركـەوتن، كـەوتنی مريشـك لەسـەر هێلكـە بـۆ مەبەسـتی هـەڵ هێنان. |
| احتطاب | Wood cutting | داربڕينەوە. |
| احتفال | Festival | بەزم، ڕەزم، ئاهەنگ. |
| احتقان | Congesation | ئاوسان، سووربوونەوە، خوێن تێزان، تێزانی خوێن، كۆبوونەوەی خوێن لە شوێنێكدا. |
| احتكار | Monopoly | دەست بەسەرا گرتن، بۆ مەبەستی شاردنەوە. |
| احتكاك | Friction | فريكشن، لێك خشاندن، لێك خستن. |

| | | |
|---|---|---|
| احتلاب | Milking | دۆشین. |
| احتلال | Occupation | داگیرکردن. |
| احتلام | Puber ty | باڵقبوون، شەیتانی بوون. |
| احتياط | Caution | جێگر، یەدەگ، دەژ. هێڵراوە. |
| احتياطات | Precautional | قایمەکاری. |
| احتيال- ابتزاز | Peculalion | پارەکێشانەوە، پارە دەرهێنان لە کەسانی تر. |
| احجية-لغز | Puzzle=Riddle | مەتەڵ. |
| احجار مرصوصة | Compact stones | سەلبەند، تەلان. |
| احد | One | یەکێك، کەس، یەك. |
| احداثي - تنسيق | Coordinate | کۆئۆردینێت، ڕێکخەر، ئەو ڕووداوەیە کە ئەشێ هاوتایی یان هاوڕێژەیی بێت، دووری. |
| احداثي افقي | horizontal- Coordinate | دووری پۆیی ڕێکخەری پۆیی، کۆئۆردینی پۆیی. |
| احداثي عمودي | Columnar- Coordinate | کۆئۆردینی تانی، دووری تانی، ڕێکخەری تانی. |
| احداثي سيني | Abscissa | ئەبسیسا، کۆئۆردینی سینی، دووری سینی، ژمارەیەکی پۆزیتیڤ یان نەگەتیڤە ڕێڕەوی دووری خاڵێك (نقطة) پیشان ئەدات لە تەوەرەیەکی ترەوە. |
| احداثي قطبي | Polar Coordinate | دووریی پۆلی، ڕێکخەری پۆلی، کۆئۆردینی پۆلی. |
| احداثيات | Coordinates | دووری تان و پۆ. |
| احدب | Hump backed | کایفۆتیك، کۆم، قەموور، کووڕ، قۆقز، "پشت کۆم". |
| احدل | Crooked shoulder | شان خوار. |
| احدل | Monotestis | یەك گون، تاك گون، گیانداریکە کە یەك گونی هەبێت. |
| احديداب | Crooked | کۆمی، کووڕی، قۆقزی. |
| احراقية | Fuel | سوتەمەنی. |
| احراش - غابات | Forest | تەرت، دەوەن، بێشەلان، زەبەنگ، چڕستان، شوێنێکی سەختی چڕ. |
| احرش | Big- Mastigure | قۆڕی گەورە. |
| احسب | Albino | پێست سووری سەرسپی، یەکێکە پێست و پەلەزەی چاوی ڕەنگیی تێدا نەبێت. سەرسپی زگماك، ئەوەی لە منداڵییەوە سەری سپی بێت. |
| احسباب | Albinism | نەبوونی ڕەنگ لە پێست و تووك و پەلەزەی چاودا، پێست سوورێتی سەر سپێتی. |
| احشاء داخلية | Bowls | ناوزك، هەناو، ناوسك، پزۆر. |
| احشاء | Tostuff | پڕ کردن، داگرتنەوە. |
| احصاء | Statistics | هەڵ ژمار، ئامار، ژمێرکۆ، ژماردن، سەرژمێری ژمێرە، گەمارودان و ژماردن و کۆکردنەوەی ڕاستی دەربارەی شتێك یا ڕووداوێك بەشێوەیەکی زانیارییانە بۆ چارەسەرکردن و کۆکردنەوە، تۆمارکردنی زانیاری دوورو درێژ بەشێوەی ژمارە. |
| احصائية | Statictics | ستاتیستیکس، ژمێرە، ژمێر کۆیی، ژمێرە کردن، ئامار کردن، ئەژمار. |
| احضار | Bringing | ئامادەکردن. |
| احفور-احافير | Fossil | فوسیل، بووبەردەکان، ئەو زیندەوەرانەیە (گیاندارو ڕووەك) کە مردوون و پاشماوەکەیان لەژێر زەویدا ماوەتەوە بووە بە بەرد. |

| | | |
|---|---|---|
| احقاب جيولوجية | Geological eras | سەدە جیۆلۆجی‌یەکان، سەردەمە جیۆلۆجی‌یەکان. |
| احقب | Onager = Wildass | ئۆناگەر، وایەڵدئاس، کەرە کێوی. |
| احلال | Displace | جێگرتنەوە. |
| احلال مزدوج | Two fold displace = double displace | جێ گۆڕکێ. |
| احليل - مجرى البول | Urethra | چۆرگ گوانی میز، بۆڕی میز، میزەڕۆ، بۆڕی‌یەکە میز لە میزەڵانەوە ئەکاتە دەرەوە. |
| احليل-الحليب | | بۆڕی شیر، گوانی شیر. |
| احمرار | Redness | سووربوونەوە، سووری‌ی سوورایی، سوورهەڵ گەڕان. |
| احمر | Red | سوور. |
| احمر باهت | Faded red | سووری کاڵ، ئاڵ، پەمەیی. |
| احمر شفايف، احمر التجميل | Rouge = lipstick | رووج، سووراو. |
| احمر قاني، احمر فاتح | Blood red | سووری کاڵ. |
| احمق | Foolish | گەوج، دەبەنگ، پلەی یەکەمی عەقڵ کەمی. |
| احنى | Bend curve = bow | چەوتاوە، چەماوە. |
| احناء | Bending = bowing | خوارکردنەوە، نەواندن، دانەواندن، چەماندنەوە. |
| احوص | Small eyed | چاو بچووك، چاو بە قووڵاچوو. |
| احول | Cross eyed | خێل، تیل، چاوی تیل، چاو چەپ و ڕاست. |
| احياء | Give life to | زیندووکردنەوە. |
| احيانا | Occasionally | جارناجار، جاربەجار جاروبار، هەندێ جار. |
| احيون- كرشون - راس الافعى- اثنا | Bar bary- ragwort | (بارباری راگۆورت) گیایەکی پزیشکی‌یە، گەڵاکەی مێخەکی مەیلەو سەوزە، هەر لقێکی تەنها یەك گوڵی بە سەرەوەیە، سەرمار. |
| اخبل | Gannet | جانیت، باڵندەیەکی ئاووی گەورە و سپی‌یە لە کۆمەڵەی سەقاقوش، بەشێوەی پۆل ئەفڕێت و شێتۆکەیە. |
| اخت | Sister | خوشك. |
| اخت- حبة بغداد | Oriental sore | کانی خورما، کوانی خورما. |
| اخت الرضاعة | Foster sister | خوشکی شیری. |
| اختبار | Test | تاقی‌کردنەوە. |
| اختباز، خبازة | Bakery | نان کردن. |
| اختراع - إكتشاف | Invention= Discovery | داهێنان. |
| اختراق | To pass | پیاتێ پەڕ بوون، سمین، بڕین، دڕدان. |
| اختزال | Red uction | کەم کردنەوە، کاستی، کورت کردنەوە، وەکوو لابردنی ئۆکسجین لە ئۆکسیدی مس یان هەر ئاوێتەیەکی تر. |
| اختزال ذاتي | Self reduction | کەم کردنەوەی خۆیی. |
| اختصار | Shortning | کورت کردنەوە. |
| اختصاصي | Specialist | پسپۆر، پسپۆڕی توانایی و لێ هاتنی کەسێك بۆ فرمانێکی تایبەتی. |
| اختطاف | Snatching = kidnap | رفاندن، فڕاندن: |
| اختفاء | Disapperance | خۆشاردنەوە، مەڵاس بوون. |

| | | |
|---|---|---|
| اسي | Doctor=Phsiciar | (دوکتۆر) پزیشك، دوختۆر. |
| اســـي- حبـــلاس- مرســـين- حلموش- مرد- قمام- عمار | Myrtle | مـۆرد، مـۆرت، دەوەنێکـی هەمیشـە سـەوزی بـۆن خۆشـە، بـۆ پـەرژین ئەروێنرێت، جاری وا هەیـە هـەتا "٤" مـەتر بەرز ئەبێتـەوە، گـەڵاکانی بچووکە، گوڵەکانی سپی یا ئەختێ سوورو بۆن خۆشە بەرەکەی وەك ترێ وایە و ئەخورێ و بۆ رەوان کردن باشە، رەشی مەیلەو شین و بۆن خۆشە. |
| اسيتال | Acetal | (ئەسیتاڵ)، شلەیەکی بێ رەنگی بۆن خۆشە لە شەرابدا هەیە. |
| اسيد الحناء | Henna ocelot | شێرۆکەی خەنە، شێرۆکەی خـەناوی، جۆرەگیاندارێکـە لـە شـێر ئـەچێت رەنگەکەی خەنەییە. |
| اسير | Prisoner of war | دیل. |
| اسيت الديهايد | Acetaldehyde | (ئەسیت ئەلدیهاید)، ئاوێتەیەکـە لـە کـاربۆن و هێدرۆجـین و ئۆکسـجین، شلەیەکی بێ رەنگە، زوو ئەکوڵێ بۆنێکی تیژی هەیە. |
| اسيتيلين | Acetylene | (ئەسیتیلین)، گازێکە لە کاربۆن و هیدرۆجین پێکهاتووە بـۆ سـووتاندن و دروستکردنی لاستیك و لەحیمکردنی کانزاکان بەکاردێت. |
| اسيتون | Acetone | (ئەسیتۆن)، شلەیەکی بێ رەنگە زوو گڕ ئەگرێ، لە کاربۆن و هیدرۆجین و ئۆکسجین پێکهاتووە، بۆنی ئەلکحوولی لـێ دێت توێنەرەوەیەکی باشە بـۆ بۆیە. |
| اسيد الجبل | Cacomistle | (کاکۆمیسـتل) گیاندارێکی گۆشـتخۆری بچووکی کلـك درێـژە لـە پشـیلە ئەچێت، شێرۆکەی شاخی. |
| اسيديا | Ascidia | (ئەسیدیا)، جۆرە گیاندارێکی خڕە بە بەردی قەراخ دەریاکانەوە ئەنووسێ. |
| اسيا | Asia | (ئاسیا)، گـەورەترین پێنـج کەرتـە "کیشـوەرە"کەیـە ڕووبەرەکـەی نزیکـی سێ‌یەکی ڕووبەری خڕۆکی زەوییە، بە دەریـای بەسـتەڵەکی بـاکووری و ئەوڕۆپاو دەریـای ناوەڕاسـت و دەرای سـوورو زەریـای هینـدی و زەریـای پاسیفیکی دەورەدراوە. |
| اسيد فنيك | Phenol | (ئەسـفەنیك) شـلەیەکی ڕەشـی مەیلـەو قاوەییـە، بۆنێکـی تیـژی هەیـە، لەناودا ڕوونئەکرێتەوە بۆ پاکژکردنەوەی ناودەست بەکاردێت. |
| اشارة | Sign=Mark | نیشانە. |
| اشاءة | | چووزی یا ئەمامی دارخورما. |
| اشارة سالبة | Negative sign | نیشانەی نەگەتیف "-" سارد. |
| اشارة موجبة | Positive sign | نیشانەی پۆزیتیف "+" گەرم. |
| اشارة ضوئية | Light sign | نیشانەی ڕووناکی. |
| اشـــابة، تضريـــب عكسي | Cross- breeding | (کـرۆس بریدینـگ)، جووتگرتنـی دوو وەچـەی جیـاواز لەیـەك جـۆرە زیندەوەر، وەکوو پەراندنی گای هۆڵندی لە مانگای خۆماڵی. |
| اشابة | Alloy | (ئەلۆی)، دارشتە، تێکەڵاوی دوو میتاڵ یان زیاتر وەکوو لە پارەو زێڕدا. |
| اشارة الضرب | Multiply | نیشانەی لێکدان. |
| اشارة الجمع "+" | Addition = pluse | نیشانەی کۆکردنەوە. |
| اشارة الطرح"-" | | نیشانەی لێدەرکردن. |
| اشاعة | Publication = Romoure | واتەوات، ووت ووات، کاڵە کورد، مقۆمقۆ. |
| اشاعر | Edges of vulva | لچی زێی گیاندار، لچی شەرمگەی گیاندار. |
| اشباه الانسان | Anthropoids | کۆمەڵە مەیمونێکن لەشیان گەورەیە و لە مرۆڤ ئەچن. |

| | | |
|---|---|---|
| شباه الشحوم | Lipoid | (ليپويد) نيمچه ڕۆنەکان. |
| شباع | Saturation | تێرکردن. |
| شبور- صقر آكل الحيات = اكبد- قوقش | Snake-Eater-hawk | (پۆليبورەس)، مارخۆر، جۆرە باڵندەيەکی گۆشتخۆرە، ڕەنگەکەی مەيلەو سوورە، هێڵی سپی و بۆری تيايە، لەسەر لاشە و مارو مێروو ئەژی. |
| شتر | Estrophy | چاوداپچڕاو، لچ داقڵيشاو، لچ بڕاو. |
| شتهاء | Long fordesire | ئارەزوو، ئيشتيا مەگيز، دڵ بردن. |
| شتعال | Ignition | سووتان، ئاگرگرتن، ئاگر تێبەربوون، هەڵگيرسان، داگيرسان. |
| شتداد الباه | To become erect | حەشەرێتی، ئارەزووی جووت گرتن، ئاڵۆشی ڕەگەزی. |
| شتقاق | Derivation | لێوەرگرتن. |
| شتعال ذاتي | Self Ignition | سووتانی خۆيی، خۆسووت. |
| شتراك | Partnership | هاوبەش کردن، بەشداری. |
| شتيار العسل | Gathering haney | دەرهێنان و کۆکردنەوەی هەنگوين. |
| شتياق | Longing | پرزە، ئارەزوو. |
| شتياق الى الوطن | Home sickness | دەردی دووری، سۆزی نيشتمان. |
| شتراكي | Socialist | (سۆشياليست) کەسێك کە بيرو باوەڕی سۆشياليستی هەبێت. |
| شتراكية | Socialism | (سۆشياليزم)، هاوبەشێتی، بيرو باوەڕێکە، ئامانجەکەی ئەوەيە کە باری کۆمەڵايەتی بگۆڕێت بە جۆرێکی ئەوتۆ کە هۆيەکانی بەرهەم هێنان هاوبەش بێت، وە دارايی دابەش بکرێت بەسەر کۆمەڵ دا، هەروەها ئيش و مادەی بەکارهێنان دابەش بکرێت بەسەر هەمووان دا. |
| اشخاص- شلجم برى- رحل | Euphorbia | (يۆفۆربيا ئەپيوس)، شيرماری ڕەگ هەرمێيی، ڕووەکێکی دەشتەکی پزيشکیيە، ڕەگەکەی ئەستوورە ڕۆنێکی سووکەڵەی لێ دەرئەهێنرێت بۆ مەبەستی پزيشکی. |
| اشخص | Bended tooth | ددان خوار. |
| اشخيص- اداد- شوك العلك- اسد الارض قاتل الاسد | Spindle wort | دڕکی بنێشت شيری زەوی، ڕووەکێکە ڕەنگی گەڵاکەی ئەگۆڕێت و ڕووەکەکانی نزيك ئەفەوتێنێت، ڕەگ و تووەکەی ژەهرە. |
| اشراقة | Radiance | ڕەونەق، گزنگ. |
| اشراق الارض | Shining | زەوی هەڵات، ئەو ڕووناکی ڕۆژەی کە لە زەوييەوە ڕەت ئەبێتەوە. |
| اشر | Eye lashe | برژانگ، برژۆل، دڕکی لەشی گياندار. |
| اشراس- صاصل- صوصلاء | Ornitho-galum | (ئۆرينثۆگالۆم)، ڕووەکی سرێش، جافيلۆن، ڕووەکێکی پيازیيە، نێرکەکەی پووچە، گەڵاکەی درێژەو ووشکە، گوڵەکەی بەشێوەی هێشووە سپی يا سەوز يا زەردە. |
| اشراف | Super vision | سەرپەرشتی. |
| اشران- طفلق- زلائق الملوك- سرة الارض- خبز القاق | Cotyledon | جۆرە ڕووەکێکە. |
| اشرفي | | ئەشرەفی، جۆرە گوڵێکە. "ك" ئەشرەفی، بەردێکی بەنرخە. |
| اشرة- مرز | Ovipositor | ئەندامی چەقاندنی گەرای مێروو لە زەويدا وەکوو لە کوللەدا. |
| اشرب | White redden | سپی مەيلەو سوور. |

| | | |
|---|---|---|
| اشرج | One testicled | یەك گون، تاك گون. |
| اشرف- حبوش | Baf | جۆرێكە لە شەمشەمە كوێرە. |
| اشعة | Rays | تیشك، تیشكەكان. |
| اشعاع كهرومغناطیسی | Electromagnetic | تیشكدانەوەی ئەلەكترۆموگناتیكی، هێڵەكانی كایەی (هێزی) موگناتیكیو كارەبایی كە لە لەرینەوەی بارگەی كارەبایی پەیدا ئەبن. |
| اشعة لیزر- اشعة الموت | Laser rays | (تیشكی لیزەر) تیشكێكی كارەبایی موگناتیسییە، یەك ڕەنگی هەیە وەك ڕەنگی سوور، لە زانیاری پزیشكی و زیندەوەری و كیمیاگەری و فیزیا و رادارو تیشكی مرێنەردا بەكاردەهێنرێت. |
| اشعاع تشرنكوف | | تیشكی تشیرنیكۆف، تیشكێكی مەیلەو شینە لە هەندێك مادەوە دێتە دەرەوە كاتێك كە بەر تیشكی گاما ئەكەوێت. |
| اشعر | Hairy | تووكن، تیسكن، قژن. |
| اشعة بكرل | Becquerelrays | (تیشكی بەكەرێل) ئەو تیشكەیە كە لە كانزای "یۆرانیۆم" دێتە دەرەوە، وەتوانای سمینی تەنەكانی هەیە. |
| اشعة القناة- اشعة القنال | Canal rays | (تیشكی كاناڵ).. |
| اشعة اكتینیة | Actini rays | (ئەكتینیك رایس) تیشكی ئەكتینی، بەشێكە لە تیشكی ڕۆژ كارئەكاتە سە فیلمی فوتوگرافی. |
| اشعة المصعد | Anode rays | (تیشكی ئەنۆد) تیشكی جەمسەری گەرم. |
| اشعة المهبط | Cathode rays | (تیشكی كاثود) تیشكی جەمسەری سارد، بریتییە لەلێشاوێك لە ئەلەكترۆن. |
| اشعة میزر | Maser rays | (تیشكی میزەر) جۆرە تیشكێكە تەنها یەك ڕەنگی هەیە وەكو ڕەنگی سوور. |
| اشعال | Ignition | سوتاندن، ئاگر تێبەردان، داگیرساندن. |
| اشعة سالبة | Negative rays | تیشكی سارد، تیشكی نەگەتیف. |
| اشعة موجبة | Positive rays | تیشكی گەرم، تیشكی پۆزیتیف. |
| اشعة مرئیة | Visible rays | تیشكی بینراو. |
| اشعة غیر مرئیة | None visible rays | تیشكی نەبینراو، تیشكی نادیار. |
| اشعة الشمس | Sun rays | تیشكی خۆر، تیشكی ڕۆژ، تیشكی هەتاو. |
| اشعاع | Radiation | (رادیێشن) پرشنگدانەوە تیشكدانەوە، شەپۆلێكە، یا تیشكێكە ووزەی تیا بێ، ئەو ووزەیەی كە لەمادەوە دێتە دەرەوە بەشێوەی هێڵی راست بە بۆشاییدا ئەڕوات. |
| اشعة فوق البنفسجیة | Ultraviolet rays | (ئەلْترا ڤایولێت رایس) تیشكی سەرووی بنەوشەیی، ئەو تیشكەیە كە درێژی شەپۆلەكەی كورتترە لە درێژی شەپۆلی ڕووناكی ئاسایی. |
| اشعة تحت الحمراء | Infrared rays | (ئینفرید رایس) تیشكی ژێر سوور تیشكێكی كارەبایی موگناتیسییە درێژی شەپۆلەكەی ئەختێك لە شەپۆلی ڕووناكی ئاسایی درێژترە. |
| اشعة الفا | Alpha rays | (تیشكی ئەلفا) یەكێكە لەو "٣" تیشكەی كە لە مادە تیشك دەرەوەكانەوە دێتە دەرەوە، پارچەكانی بریتییە لە ناوكی ئەتۆمی هیلیۆم، واتە بریتییە لە دوو پرۆتۆن و دوو نیۆترۆن، كارەبای گەرمی (پۆزیتیف) لەسەرە. |
| اشعة بیتا | Beta rays | (تیشكی بێتا) یەكێكە لەو "٣" تیشكەی كە لە مادە تیشك دەرەوەكانەوە دێتە دەرەوە، پارچەكانی لە ئەلەكترۆن ئەچێت، كارەبای ساردی لەسەرە خێراییەكەی لە خێرایی تیشكی ڕۆژ ئەچێت توانای تێپەڕ بوونی هەیە بەناو مادەكان دا زیاتر لە تیشكی ئەلفا و گاما. |

| | | |
|---|---|---|
| اشعة كاما | Gamma rays | (تیشكی گاما)، یەكێكە لەو "٣" تیشكەی كە لە مادە تیشك دەرەوەكانەوە دێتە دەرەوە، ئەم تیشكە مادە نیيە، توانایەكی زۆری هەیە بۆ تێپەڕ بوون بە ناو مادەكانا. |
| اشعة كونية | Cosmic rays | (كوزمیك رایس)، تیشكی گەردوونی، ئەو تیشكەیە كە لە شوێنێكی نەزانراوەوە لە بۆشایی دەرەوە دێت بۆسەر زەمین بە خێراییەكی یەجگار زۆر. |
| اشعة سينية= اشعة رونتكن- اشعة ايكس- اشعة مجهولة | x-ray=Roentgen | (تیشكی رونتكەن، تیشكی ئێكس، تیشكی سینی) تیشكی نەزانراو، لە بۆرییەكا كە بەتاڵ كرابێتەوە لە هەوا، ئەگەر لێشاوێكی ئەلەكترۆن لە ژێر پاڵەپەستۆیەكی كارەبایی زۆر و بەخێراییەكی زۆر بەر نیشانەیەك "هدف" لە كانزای "تەنگستن" بكەوێت، جۆرە تیشكێك پەیدا ئەبێت كە پێی ئەووترێ تیشكی ئێكس، ئەم تیشكە لە ڕەوشتیا لە تیشكی ڕووناكی ئەچێت وە زۆر كورتە، بە چاو نابینرێ. بەڵام توانای بڕینی لەوحێكی هەیە كە ئەستورییەكەی چەند ئینجێك بێت، كاریش ئەكاتە سەر فلیمی فۆتۆگرافی، لەبەرئەوە بەكارئەهێنرێ بۆ وێنەگرتنی دیوی ناوەوەی مادەكان، وەكو لەشی ئادەمیزاد، وە ئەم تیشكە زانا "رونتكن" لە ساڵی "١٨٩٠" دا دۆزییەوە. |
| اشعث | Unkempt | گژ، بژ، یەكێك كە قژی بژبێت. |
| اشفة | Big lipped | لچە، لچ ئەستوور. |
| اشقر | Blonde | بەڵەك، بازوو، بازك، شڵ، سورفل. |
| اشقيل، عنصل، بصل الحية، بصل الفأر، عيسلان | Scilla | (سسیلا) پیازە مشكانە، پیازە خوگانە، پیازە مارانە، قوڕاوە، جاڵقێنە، ڕووەكێكە بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| اشل | Paralysed | كوڵ، رینجۆ، كۆج، شەل و گێڕ، ئیفلیج، قۆپ. |
| اشلاق - اسماك غضر وفية | Cartilaginous fishes | (كارتیلێجینەس) ماسییە كرکراگە دارەكان. كۆمەڵە ماسییەكن لە جیاتی ئێسك كركراگەیان هەیە وە بێچوەكانیان لە سكیانا هەڵ دێن وەكوو كۆسە. |
| اشمئزاز | Disgust=aversion | بێزلێكردنەوە، قێز لێكردنەوە. |
| اشمط | Gray haired | بۆز، قژ، ڕەش و سپی، قژ ماش و برنج. |
| اشنة- كشة العجوز- مسواك القرود | Lichen=Alagae | (ئەڵجی، لیجن) قەوزە، ڕووەكێكی بێ گوڵە لە شوێنی شێدار ئەڕوێ، مادەی كلۆرۆفیلی تیایە، لەشی لەیەك خانە یان ڕیزە خانەیەك پێك هاتووە وەكو (ئۆسیلتوریا) و (كلامیدۆمۆناس). |
| اشنان- غاسول- حرض= ابو قابس | Salicornea= saltwort | (سالیكۆرنیا، سالت وورت) بەلۆچە، كەفكەفۆك حوژە، ئەسپۆن، زروێ، گیایەكە بنكەكەی سپییە ئەكوترێت لە جیاتی سابون بۆ دەست شتن بەكار دێت. |
| اشنة حمراء | Redlichen | (پۆلیسیفونیا) قەوزەی سوور. |
| اشنج | | گیاندارێكە كە گونێكی لە گونەكەی تری بچووك تربێت. |
| اشهل | Blue eyed | چاوڕەشی مەیلەو شین، چاوشین، چاوبەڵەك. |
| اشهب | Grey | "گرێی" بۆز، بۆر، سپی مەیلەو ڕەش، ماش و برنج تووكی ڕەش و سپی. |
| اشواء | Roasting | برژاندن. |
| اشول | Left handed | چەپلەر. |
| اشوری | Assyrian | "ئەسیریان" ئاشوری. |

| | | |
|---|---|---|
| اشياء | Things | شت و مەك. |
| اصابة | Accident | تووش بوون، تووش هاتن، ئەنگاوتن، پێكاندن، لێك دان. |
| اصالة | Noble origin | ڕەسەنی. |
| اصابة بالبرد | To take cold | باپەڕ، سەرمابردە، سەرما بوون. |
| اصابع العروس- قرنبوش، بسلة سكرية | Four winged pea | (فۆروینگیدپیی) پەنجەی بووك، ڕووەكێكی كێوی و كشتوكاڵی‌یە، بەرەكەی وەك بەری پاقلە وایە، دەنكەكەی وەك قاوە وایە و شیرینە بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| اصابع ملتحمة | Knitting fingers | پەنجەی پێكەوە نووساو. |
| اصابع صفر- كركم | Lurmeric | زەردەچەوە. |
| اصابع جاسية | Rigid fingers | پەنجەی بێ جومگە. |
| اصار | Grass=Herb | گژو گیا. |
| اصبع | Finger | پەنجە، ئەنگوست، ئەموست، قامك، پیلك، تل، تلی. |
| اصبع اثری | Monu mental fingers | چقە. |
| اصبع العذراء | Digitalis=foxglove | (دیجیتالیس) پەنجەی خانم. |
| اصبع كزم | Brachy dactlia | پەنجەی كورتی ئەستور. |
| اصدار | To send | دەركردن. |
| اصدف | Knock kneed | پەیزەن، كەسێك یان گیاندارێك پێی بۆ دەرەوە بێت. |
| اصرد | | سەرما بردەڵە. |
| اصرار | Persistence | وورك گرتن، لەسەر ڕۆیشتن، سووری‌ی. |
| اصرة | Bond | (بۆند) پەیوەستی. |
| اصرة ايونية | Ionic bond | (بۆندی ئایۆنی) ئایۆنە بەند، پەیوەستی ئایۆنی. |
| اصرة تجاذبية | Gravitic bond | (بۆندی ڕاكێشان) پەیوەستی ڕاكێشان. كێشە بەند. |
| اصرة تساهمية | Convalent bond | (بۆندی هاوبەشی) پەیوەستی‌ی هاوبەشی. هاوبەشە بەند. |
| اصرة تناسقية | | (بۆندی ڕێك) پەیوەستی‌ی ڕێكخراو، پەیوەستی‌ی ڕێك. ڕێكە بەند. |
| اصرة كيمياوية | Chemical bond | (بۆندی كیمیایی) پەیوەستی كیمیاگەری، پەیوەستی كیمیایی. |
| اص= اس | Ashy fox | (ئاس، كاما) ڕێوی‌یەكی خۆڵەمێشی گوێ درێژە. |
| اصطكاك الاسنان | Gnathing of teeth | دانە چۆقێ، كرەی ددان، چۆقە چۆقی ددان. |
| اصطفاف | Take position in line | ڕیزبوون. |
| اصطياد | To hunt | ڕاوكردن. |
| اصطبل | Stable | تەویلە، گەوڕ، پشتێر. |
| اصطدام | Collision | لەیەك كەوتن، بەریەك كەتن، بەیەكاماڵین. |
| اصطفاء | To select | هەڵبژاردن. |
| اصطناعی | Artificial | دەستكرد. |
| اصطرك | Storax | (١) (ئەستەرك)، درەختێكی جوانە "٣-٦م" بەرز ئەبێتەوە، گەڵاكانی خوارەوەی سپی‌یە، گوڵەكانی سپی‌یە، لە ناوچە فێنكەكان ئەڕوێ، سوودێكی پزیشكی هەیە، (٢) زەمقی شیرین، مادەیەكە لە توێكڵی ناوەوەی درەختی "ئەستەرك" دەرئەهێنرێ. |

| | | |
|---|---|---|
| صـطلاح | Idiom | (ئايديەم)، زاراوە، چەند ووشەيەك كە پێكەوە يەك مانايان هەبێت، وەكوو زاراوى قارچكە مارانە. |
| صـغر | Microcephalic | (مايكرۆ سيفاليك) كەسێك سەرى درێژكۆلە بێ، سەردرێژ، سەر بچووك. |
| صـف- كبرشانك | Spiny caper | شێفە لەتەى دڕكاوى. |
| صـفر | Yellow | زەرد. |
| صـفر برتقالى | The coloor of bilter orange | نارنجى. |
| صـفر ملوكى | Arsenic sulfide | (ئەرسنيك سەلفيد) ژەهرى مشك. |
| صـفرار | Yellowness | زەردى، زەردهەڵگەڕان. |
| صـفرار الوجه | Pale | ڕەنگ هەڵبزركان. |
| صـفر القدمين | Yellow leged | لاق زەردە، باڵندەيەكە لە قەراغ ئاو ئەژى لاقى درێژو زەردە. |
| صـف | Caper | شيفەلەتە، جۆرە رووەكێكە. |
| صـفرنى | Paracoda | (پاراكۆدا) جۆرە ماسىيەكە. |
| صـقاع ساحلية | Sea shore | ناوچەى قەراغى دەرياكان. |
| صـر | Origin | (ئۆريجن)، ڕەسەن، نەتەوە، توخم، بنەڕەت، ڕيشە، بيخ، بنەماڵە، ڕەگەز، رەتەوە، سەرچاوە، نەژاد، سفن. |
| صـر الانواع | The origin of the species | بنەڕەتى جۆرەكان، سەرچاوەى جۆرەكان. |
| صـة | Python | (كوكاترايس، پايثۆن)، ئاژديها، گەورەترين مارە، شامار، هەندى جار درێژىيەكەى ئەگاتە (٨) مەتر وە تيرەكەى (٢٥سم) ژەهراوى نىيە و نێچيرەكەى قووت ئەدات وە لە نزيكى ئاوا ئەژى. |
| صـر الفخذ | The origin of the thigh | ئەشكنج. |
| صـر الشجرة | | كۆتەرە، كوتكەدار، كۆتە، بنكەدار، قوتم. |
| صـد | Solid | پتەو. |
| صـلع | Bald | قژ ڕووتاوە، سەرتاووس، سەرتاس، سەر ڕووتاوە. |
| صـلم | To plock out ear | گوێ قرتاو، گوێ كوڵ. |
| صـلاح | Repairing | چاك كردن. |
| صـلاح ذاتي | Self - Reformation | چاك كردنى خۆيى، خۆ چاك كردن. |
| صـلاح زراعى | Land Reform | چاك كردنى كشتوكاڵ. |
| صـمع- اسك | Microtic | (مايكروتيك). |
| صـمع | Small ear | گوێى بچووك. |
| صـم- لخرس | Deaf | كەڕو لاڵ. |
| صـم | Deaf = dumb = mute | كەڕ، گوێ كپ، گوێ قورس. |
| صـهب | Blond<br>A cold day | (١)شـل، شێ، ڕەنگى سوورو سپى تێكەڵاو، سوورى مەيلەو سپى، سوورڤل، قژ زەردى چاو شين. (٢)ڕۆژێكى سارد. |
| صـى | Red kite | كۆلارەى سور، سوورە باڵە. |
| صـيد | Indirect neck | مل خوار. |
| صـيل | Of noble origin | ڕەسەن، تەواو، بەهزاد. |
| صـيل | Evening | دواى عەسر، زەردەى هەتاو، زەردەڵ پەڕ، خۆرە زەرد ماوەى نێوانى عەسرو ڕۆژئاوا، زەرە كەتاو. |

| | | |
|---|---|---|
| اصيص- اجانة | Flower port | ئينجانه. |
| اضاءة= انارة | Luminous | (ليۆمينيسيس) ڕووناك كردنەوە. |
| اضاض | Refugee | پەناگە. |
| اضافة | Addition | خستنەسەر، خستنە پاڵ. |
| اضافة الى | Addition | سەرەڕای. |
| اضاليا، اضالية، دهلية | Dahlia | (داهليا، جۆرجينا)، جۆرە گوڵێكە ڕەگەكەی چەند سەلكێكی پێوەیە، گەلێ جۆری هەیەو گوڵی جوان ئەگرێت. |
| اضبارة | File | فايل، بەستەكێك كە كاغەزی نووسراوی تێدابێت، دۆسیە. |
| اضحوكة | Laughing | قەشمەری. |
| اضراس | To set teeth on edge | ڕووانەوەی ددان، ددان دەرهاتنەوە. |
| اضراب | Strike | مان گرتن. |
| اضرام | Kinding | ئاگر تێبەردان. |
| اضطراب عصبي | Nervous disorder | پشێوی‌ی دەماری. |
| اضطجاع | Lying down | ڕاكشان، لەسەر تەنیشت نووستن. |
| اضطرار | Compulsion | ناچاری، ناچاربوون. |
| اضطراب | Disorder | ئاشوب، پشێوی، ئاژاوە، شپرزەیی، شڵەژان، تێك چوون، پەشێوی، شێواوی. |
| اضغاط | Pressing =Stuffing | تێ ئاخنین، پەستاوتن، تێترنجاندن، پەشتاندن. |
| اضنفورة، فطومة | Gland bill flower | (گلاندبیڵ فلەوەر)، گوڵە زەنگوڵەی زەوی، گیایەكی سەلك دارەو گوڵی جوان ئەگرێت. |
| اضوط | Indirect chin | چەناگە خوار. |
| اضوية المرور | Trafficlight | ڕووناكی‌ی هاتوچۆ كردن، گڵۆپی هاتوچۆكردن. |
| اط، اطيط | The sound of camel | ووشتر، دەنگی ووشتر. |
| اطار | Frame | چوارچێوە، چەمە، چەمەر، چەمەرە، پەراوێز، ئەڵقە، تار. |
| اطار الغربال | The frame of the cribble | كامار، چەمە، چەمەر، كەمە. |
| اطار السيارة | Tire=Tyre | تایەر، تایەی ئۆتۆمبێل. |
| اطار الباب | The frame of the door | باهو، لاشیپان. |
| اطار هوائي | | چووپ. |
| اطار الغزل | Spining frame | پەنك. |
| اطالة | Elongation | درێژە پێدان، درێژكردن. |
| اطام | | نەخۆشی‌یەكە تووشی ئاژەڵ ئەبێت، وای لێ ئەكات كە میز و پشقڵ نەكات. |
| اطباق | To shut=Lofold | قوچاندن، نوقاندن. |
| اطر- عثر- بدلية | | (بە دڵ) جۆرە دارو دەوەنێكە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە ئەروێنرێت. |
| اطراء | Praise=Eulogy | ستایش، زبان لووسی. |
| اطرش | Deaf | كەر. |
| اطرة | Corona | (كراون، كۆرونە)، گۆشتی دەوری نینۆك، بێخی نینۆك بێخی سمی ووڵاخ، نێوانی مەچەك و سمی ووڵاخ، خەرمانەی سم. |
| اطرليون | | گوڵە سیانە، ڕووەكێكە گوڵی سێ‌پەلك ئەگرێ. |

| | | |
|---|---|---|
| طروحة | Thesis | بڕوانامەیەکی بەرز، باسێکی زانیاری یان ئەدەبی کە دانرابێت لەلایەن یەکێکەوە، وە ئامادەکرابێت بۆ لێکۆڵینەوە و سەلماندن بۆ مەبەستی وەرگرتنی بڕوانامەیەکی بەرز. |
| طرق | Lame | گێڕ، پەیزەن، یەکێك قاچی گێڕ بێت. |
| طرش | | (ئەثیۆرەس)،گیاندارێکی قرتێنەرە لە ژیشك ئەچێت و لەشی دڕکاوی‌یە، لە کون و کەلەبەری ژێر زەوی دا ئەژی، مارو مێرو ئەخوات. |
| طرية | Shreded biscuit | هەرشتە. |
| طريفل | Marsh trefoil | (مینیانیش)، هەلیلە، درەختێکی ئاویی ناوچە گەرمەکانە، گەڵاکەی سێ پەلکەو لە سێ پەڕە ئەچێت، گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی سپی مەیلەو پەمەیی‌یە. |
| طريون | Wild cucumber | خەیارە کێویلە، خەیارە کەرانە، شەرواڵ بە کوڵ، ڕووەکێکە بەرەکەی تاڵ و ڕەوانکەرە لە خەیارێکی بچووك ئەچێت، کە پێ ئەگات لە ڕووەکەکە دەرئەپەڕێت و ئەتەقێت و تۆوەکەی ناوی بڵاو ئەکاتەوە. |
| طريال- سرفل- جزر الشيطان- حشيشة البرص- حشيشة البهق- رجل الغراب | Chervil | (چێرڤیل)، ڕووەکێکە گوڵەکەی سپی‌یە، بەرەکەی ووردو ڕەشە و بۆن خۆشە، بۆ مەبەستی چارەکردنی نەخۆشی پێست بەکاردێت. |
| طريلال | Carum | (کاروم) کۆمەڵە ڕووەکێکی چەتردارن وەکو کەراوایەو زیرەو مەعدەنووس.. |
| طعام | To feed | دەرخوارد دان. |
| طفاء الحريق | Extinguishing | کوژاندنەوەی ئاگر، ئاگر بڕ، دامراندن. |
| طفائية | Extinguisher | دام و دەزگای ئاگر کوژاندنەوە، کۆمەڵێك لە فەرمانبەران و کارگوزاران کە فرمانەکەیان ئاگر کوژاندنەوە بێت. |
| طنس | Atlas | (ئەتلاس) یەکێکە لە بڕبڕەکانی پشت. |
| طم | Pile=heap | کەڵەکە. |
| طلاع | Notice | ئاگاداری. |
| طلاق | To free = Release | تەقاندن، بەرەڵاکردن، ئازادکردن، ڕزگارکردن. |
| طلاق سراح | To set free = Release | ڕەها کردن. |
| طلس | Atlas | (١) قوماشی ئاوریشم. (٢) پەڕوای نەخشە، فەرهەنگی نەخشە. (٣) یەکەم بڕبڕەی مل. |
| طلس | Ashy wolf | (سیڤەر وولف) گورگی خۆڵەمێشی. |
| طمة | Fire place | ئاگردان. |
| طمئنان | Peacefulness | دڵنیایی. |
| طن- فهنة- ارنبية | Arnebia | جۆرە گیایەکە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە یان دەرهێنانی ڕەنگ ئەڕوێنرێت. |
| طوم- زالحة- ملصة- ناقة البحر- حنفاء | Dugong | (هالیکورە، دەنگونگ، سییل) مانگای دەریا، گیاندارێکی شیردەری ئاوی‌یە لە ڕەگەزی نەهەنگ، بەشی پشتەوەی "خوارووی" لەشی لە ماسی ئەچێت دوو دەستی هەیە، قاچی نی‌یە، گیاخۆرەو گۆشتەکەی ئەخورێت. |
| اطيش | Booby | (بووبی)، کەرەواڵە، باڵندەیەکی دەریایی سپی‌یە لە ناوچە گەرمەکاندا ئەژی و لە سەقاقوش ئەچێت. |
| اطيمة | Fire place | (فایرپلێس)، ئاگردان. |
| اظفر | Nail | نینۆك، ناخوون. |

| | | |
|---|---|---|
| اظفار الجن | | نینۆکی جنۆکە، گیایەکی بێ گوڵ و گەڵایە. |
| اظفور | Tendril | تەرزی ڕووەك بۆ خۆهەڵواسین. |
| اظفار الطيب | Unguis-Odorous | (ئونگویس، ئودوراتەس) بۆنێکی خۆشە لە پەرەی هەندێك شەیتانۆکە دەرئەهێنرێت. |
| اظلام العدسة= ساد | Cataract | (کاتاراکت) ئاوی سپی‌ی چاو، ئاوی چاو داهاتن، بریتی‌یە لە لێڵبوونی زەرەبینی چاوکزبوونی هێزی بینینی بەهۆی پیری و هەندێ نەخۆشی‌یەوە، بەنەشتەرگەری "پزیشکی تایبەتی" چارەی ئەکات. |
| اظهار | Revelation | دەرخستن، ئاشکراکردن. |
| اعادة | Repeating | دووبارەکردنەوە، ناردنەوە. |
| اعاشة | Nourish | بژێوی، بژێو، ئازووقە. |
| اعانة | Assistance | کۆمەك، پیتاك. |
| اعتباطى | At randon | بەبێ هۆ. |
| اعتدال | Equinox | (ئیکۆینوکس) ڕۆژگەڕانەوە، یەکسان بوونی شەوو ڕۆژ. |
| اعتدال خريفي | Autumna equinox | فێنکی‌ی پاییز، بەرامبەری شەوو ڕۆژ لە پاییز دا، ڕۆژ گەڕانەوەی پاییز. |
| اعتدال ربيعي | Vernal equinox | فێنکی‌ی بەهار، بەرامبەریی شەوو ڕۆژ لە بەهاردا، ڕۆژ گەڕانەوەی بەهار. |
| اعتذار | Plea = apologize | بوردن خوازی. |
| اعتراض | Objection=protest | پەلپ، پەلپ گرتن، بیانو، بەرپەرچ، نارەزایی، ناقایلی. |
| اعتراف | Confession | دان پیانان، ناسین. |
| اعتزال | Retirement | کەنارگرتن، تەریك بوون، وازهێنان. |
| اعتقاد | Trust | باوەڕ، بڕوا. |
| اعتماد | Reliance | راپەڕموون، پێ راپینین، متمانە. |
| اعتماد على النفس | Self - reliance | متمانە بە خۆ کردن، بەخۆدا راپەڕموون. |
| اعتماد مالي | fund | پشتیوانەی دارایی. |
| اعتمار | Mastur bition | دەسپەڕ. |
| اعتناء | Care=Attention | بەتەنگەوە بوون، خەمخواری، چاوەدێری. |
| اعتيادي | Usual = Normal | ئاسایی ڕەشۆکی. |
| اعجر | Unripe | زرك، کاڵ، نەگەییو. |
| اعجف، جحف | Alean pasture | لەوەڕگەیەکی کەم گیا. |
| اعدادية | Secondary | ئامادەیی. |
| اعداد | Perparation | ئامادەکردن، سازکردن، گەڵاڵەکردن. |
| اعداد المعلمين | Training college | ئامادەکردنی فێرکار. |
| اعراض المرض | Symptoms | (سایمپتومس) نیشانەی نەخۆشی، بەرتا، لەرز، کەم خواردن. |
| اعر | Mange | گەڕ. کەسێك تووشی گەڕیی بووبێت. |
| اعرج | Lame | شەل، لەنگ، جوور. |
| اعروان | | هەر ڕووەکێك لە زستاندا گەڵاکەی نەوەرێت. |
| اعزب | Un married | عازەب، هەرزەکار، بێ ژن، رەبەن، خورت، سەڵت. |
| اعسر | Left handed | چەپلەر. |

| | | |
|---|---|---|
| اعسم | Indirect leg | قاچ خوار، قاچ کەوانەیی. |
| اعشار | Primary quills | شاپەڕ، شاپەڕی باڵندە. |
| اعشاب | Weeding | بژارکردنی گژوگیا. |
| اعشى | Night blind | شەوکوێر. ئەو کەسەی کە بە شەو چاوکی کز بێت. |
| اعصار | Cyclon | (سایکلۆن) گێژەڵووکە، گێژە با، گەردەلوول، جۆرە بایەکە خوڵ یان ئاوی دەریا لەگەڵ خۆیدا هەڵ ئەگرێت ئینجا پێچ ئەکاتەوە و بەرز ئەبێتەوە، خێرایییەکەی لە ٧٥میل/کاژێر زیاترە، بابلیسك. |
| اعضب | To pluck out ear | گوێ دڕاو، گوێ بڕاو. |
| اعفاء | Exemplion | چەبدان، واز لێهێنان، لێخۆش بوون. |
| اعفط | Foolish | گەلحۆ، گەمژە. |
| اعفر- ظبی عربی | Gazella-Arabica | (گازیللا ئەرابیکا) (گازیل)، ئاسکی کێوی، ئاسك، ئاسکی بۆر، ئاسکی عەرەبی. |
| اعفش | Blear eyed | چاوکز، چاوکتوکوێر، چاوپڕووشاوی، چاوبەفرمێسك، بەیەکێك ئەووترێ کە چاوی کز بێت و ئاوی پیا بێتە خوارەوە. |
| اعفك | Left handed | چەپلەر. |
| اعقص | | کەسێك کە پەنجەکانی لەیەکترییەوە ئاڵابن. |
| اعقص | Curved horn | بزنی شاخ چەماوە. |
| اعقف- معقوف | Hooked | چەماوە. |
| اعلاف | To feed | لەوەڕاندن. |
| اعلام | In formation | ئاگاداری. |
| اعلام الزوجية | Matrimonly certificate | بەڵگەی خێزانی، ئاگانامەی خێزانی. |
| اعلان | Manifestation | بۆ زانین، یافتە، ئاگایی، جاڕ. |
| أعلى | Higher | بەرزتر. |
| اعلم | Hare lip | لێو بڕاو، لێوقڵیشاو. |
| اعمش | Blear eyed | چاوکز، چاوکتوکوێر، چاو پڕوشاوی، چاو بەفرمێسك، بەیەکێك ئەووترێت کە چاوی کزبێت و ئاوی پیا بێتەخوارەوە. |
| اعمى | Blind | کوێر "بە هەردووچاو" |
| اعماء | To blind | کوێرکردن. |
| اعماق | Fathoms | ناخ، بن. |
| اعمار | To populate | ئاواکردن، ئاوەدان کردن. |
| اعمال نارية | Fire works | دەمەر قاچان. فیشەکە شێتە. |
| اعمال يدوية | Hand work | ئیشی دەست، کاری دەستی. |
| اعنس- اعنش | Six-toed | شەش پەنجە، شەشە، ئادەمیزادی شەش پەنجە. |
| اعنب | Big nosed | لووت زل. |
| اعنت | Sickler | سەرچڵ، سەربەگێچەڵ. |
| اعنف | Sevele | دڵ ڕەق، توند و تیژ. |
| اعنق | Long necked | مل بەرز، مل درێژ. |
| اعنون- حلبة | Fenugreek | شملی. |
| اعوج | Tor thous | خوار، خێچ، خواروخێچ، چەوت، کەچ. |

| | | |
|---|---|---|
| اعور | One eyed | كوێر "یەك چاو". |
| اعوجاج | Crookedness | خواری، خێچی، چەوتی، کەچی، خواربوون، خواربوونەوە. |
| اعیاء | Faintness | کەشەنگ، شەکەت، ماندوبوون، زۆرماندوبوون. |
| اعیاء عقلی | Mental faintness | ماندوێتی مێشك، وورپبوون. |
| اغاتي | | (ئەگاتی) درەختێکی هیندییە، توێکڵی بەرەکەی تاڵە، گەڵاکەی بۆ سپی کردنەوەی کاڵا بەکاردێت، دەنکەکەی لە فاصولیا ئەچێت و ئەخورێت. |
| اغاتوسمة- زكیة | Agathosma | (ئەگاثوسما) گیایەکی بۆن خۆشە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| اغاثة | Aid=Help | دەست گرۆیی، بارێوکردن. |
| اغالوجین | Incense=Aloeswood | داری بفورد، داری بخورد، داری عوود. |
| اغار اغار- عصیدة نباتیة | Agaragar | (ئـەگار ئـەگار)، مادەیـەکی لینجـە لـە قـەوزەی دەریـا دەرئـەهێنرێ بـۆ پـەروەردەکردنی باکتریـا بـەکاردێت وە لـە پیشەسـازیی کـاڵاو کاغـەزدا بەکاردێت. |
| اغاف | Agave | (ئەگاڤ) هەنجیری دڕکاوی ئەمریکی، سوبێری ئەمریکی. |
| اغالوخن- عودالند | Agvilaria = agalloca | درەختێکی بچووکە لە هیندستان ئەڕوێت شیلەیەکی شیری "شیراوێکی" توونـی لـێ دێتـە دەرێ، ئەگـەر بەرلـەش بکـەوێت هەڵیئـەتلۆقێنێت بـۆ چارەکردنی نەخۆشی گوڵ بەکار ئەهێنرێت. |
| اغبر | Dust-colovered | بۆز، بۆر، سووری مەیلەو سپی، قاوەیی مەیلەو سپی. |
| اغبس | Sabelline | (ئیزابیل) ڕەنگی سپی مەیلەو قاوەیی "٢"هەروەها بە جۆرە گورگێك ئەووترێت. |
| اغبش | Opaque | زەردی مەیلـەو سـوور، شـتێکی بریسـکەدار بـە مـەرجێك ڕوون (شـفاف) نەبێت. |
| اغتصاب | Violation=Rape | زەوت کردن. |
| اغتیال | Assassination | کوشتن. |
| اغتسال | To wash one self | داشۆرین. |
| اغتراب | Expatriation | مشەخت، ئاوارەبوون، دوورکەوتنەوە لە نیشتمان. |
| اغتراف | To drink with hands | ئاو خواردنەوە بە دەست، ئاو هەڵێنجان لە بیر یا لە ڕووبار. |
| اغتذاء- تغذیة | To be nourish | (نیوترێشن) خواردن. |
| اغتلام- غلمة- شبق | To be lusty = Nymphomania | (نیمفۆمانیا) ئارەزووی ڕەگەزی، پەرێشانیی ڕەگەزی، بەکەڵی، بەتەڵەبی. |
| اغر | Elegant | سپی، جوان. |
| اغر | Blazed | مارۆ، هەر ئەسپێك پەڵەیەکی سپی بە ناوچەوانییەوە بێت. |
| اغراء جنسی | Sexual templation | تاوکردن، تەفرە دانی ڕەگەزی. |
| اغرل | Circumcized | خەتەنەکراو، منداڵێك خەتەنە نەکرابێت. |
| اغروان- لیلج- لیلك- ازرق | Common lilac | لـەیلاق، دەوەنێکـە گوڵێکـی بـۆن خۆشـی بەمبـەیی ئـەگرێت بەشـێوەی هێشوویەکی قووچەکی. |
| اغریراق | To be bathed in | ئاو زایینەی چاو، تێ زایینی فرمێسك لە چاو. |
| اغرة- قنزعة | Tuft of hair | (تەفت، پلوم) پەڕی سەری باڵندە وەکو لەشینە شاهۆو کڵاوکوڕەدا. |
| اغروتیس | Agrotis | (ئەگرۆتیس) جۆرە پەپوولەیەکی زیان بەخشە. |
| اغرولوجی | Agrology | (ئەگرۆلۆجی) زانیاریی زەوی دەربارەی کشتوکاڵ. |

| | | |
|---|---|---|
| اغريل | Agrilus = Buprestid | (ئەگريلەس) مێرووی داروردەخت کە توێکڵی درەختەکە کون ئەکات و زيانی پێ ئەگەيەنێت و گەلێك جۆری هەيە. |
| اغصن | Scab | توێخ، توێکڵی برينی ئاوڵە. |
| اغصن | Ox with a white tail | گای کلك سپی. |
| اغلاء | To boil | کوڵاندن، بەرووبووم. |
| اغلال | Cereals | بەرهەم هێنان. |
| اغلبية | Majority | زۆربە. |
| اغلوقوما- ماء ازرق | Glaucoma | (گلوکوما) بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی ناوچاو. |
| اغماض العين | To shut the eye | چاو نووقاندن، چاوقووچاندن. |
| اغماء | To soon= Faint | بێ هۆشبوون، بوورانەوە لە هۆش خۆ چوون، بەتەوسەوە چوون. |
| اغنام | Sheep | پەز، مەڕومالآت. |
| اغنس | | (سەرساد) بەفارسی درەختێکە کە گوایە مادەیەکی تیایە دژی ئارەزووی ڕەگەزی و ئەبێتە هۆی وەجاخ کوێری. |
| اغنية | Song | گۆرانی، ستران. |
| اغواء جنسي- راجع- اغراء جنسي | Sexual seduce = sexual temptation | تەفرەدانی ڕەگەزی. بگەڕێوە بۆ (إغراء جنسي) |
| اغوطي- اغوتي | Agouti | (ئەگوتی) گیاندارێکی قرتێنەری تووك‌و گوێ کورتە، تووکەکەی پەڵەی سوری مەیلەو رەشی تيايە لەناوچەی ئەمریکا ئەژی بەقەدەر کەروێشکێك ئەبێ قاچی درێــژو باريکــە، لــەکلۆری داروردەختــدا ئــەژی پێســتەکەی بەنرخەو گۆشتەکەی ئەخورێت. |
| اغيروس | Poplar | سپی‌دار، ڕووەکی بی. |
| آغية | Rose=Watering can | (تێرن پايك) مەکینەی ئاوپرژێن کە بۆ ئاوەدانی چێمەن بەکاردێت. |
| افاصة | Grasp | چنك. |
| افاقي- دندران | Cowvetch | (کراکا، کاوفێچ) گيایەکی دەشتەکی‌يە گوڵەکەی بنەوشەیی‌یەو بۆ لەوەڕ باشە. |
| افة | Pest | دەرد، بەلآ، نەخۆشی، هەرگۆڕانێك لە هەوا و زەوی دا کە زيان بگەيەنێت بە ڕووەك. |
| افة حيوانية | Pest | دەرد، بەلآ، نەخۆشی، پەتا، ئاسیيو. |
| افة زراعية | Bilight | (بلایت)، دۆوکە، شۆکە، دەردی ڕووەك نەخۆشی ڕووەك. |
| افتراس | Hunting | ڕاوکردن. |
| افتراق | To separate | جيابوونەوە. |
| افتخ | Big footed | دەستو پێ زل. |
| افتتاحية | Leading ar ticle | سەرووتار. |
| افتجاء، تغاير | Change | (چێنج) گۆڕان، هەر گۆڕانێکی کتوپڕ لـە گواسـتنەوەی سـيفەتی زگمـاکی زيندەوەردا ڕوودات. |
| افتراع | The falling of the leaves | گەڵا ڕێزان، وەرينی گەڵای ڕووەك. |
| افجل | | ئەو کەسەيە کە هەردوو قاچی دوورن لە يەکتری‌يەوە. |
| افحج | | گێڕ، پەی زەن، يەکێك کە قاچی گێڕ بێ، پشت خوار. |
| افدع | Indirect wrist | مەچەك خوار. |

| | | |
|---|---|---|
| افراز | Secretion | دەردراو، دەردان، بەکارئەهێنرێ بۆ دەرچوونی ئارەق یا ئاو لە لەشی زیندەوەرەوە. |
| افراز مهبلي | Secretion of vagina | لینجاوی گولنیك، شلەیەکی لینجی سپییە لە بۆری مناڵدانەوە "گولینك" دێتە دەرەوە، یان شتێکی ئاساییە "لە کاتی جووت بوونا دێتە دەرەوە" یان لە ئەنجامی نەخۆشی سوزەنەکەوەو ئاوسانی مناڵدانەوە توشی ئەبێ. |
| افراط | Extra vagance | دەرچوون لە سنوری ئاسایی، زۆرپتر لە سنووری ئاسایی. |
| افراغ | Empty | بەتاڵکردن، پیساسی کردن، دەرهاویشتن، دەردانی شتی بێ کەڵك، بەکار ئەهێنرێ بۆ فڕێ دانی شتی پیس و ڕەق لە لەشی زیندەوەرەوە بۆ دەرەوە. |
| افراق- انثيال | To swarm | کۆچ کردنی پۆرەی هەنگ لە شانەیەکەوە بۆ شانەیەکی تر. |
| افرع | Hairy | تووکن، تیسکن. |
| افرنجي- زهري | Syphilis | (سلفس) فەرەهەنگی ئاتەشەك، هالە، ئاڵە. |
| افريقا | Africa | (ئەفریکا) یەکێکە لە پێنج کەرتە "کیشوەر" کە بە دەریای ناوەڕاست لە باکوورەوە زەریایی ئەتڵەنتیکی لەخۆرئاواوە، دەریای سوورو زەریای هیند لە خۆرهەڵاتەوە دەورە دراوە. |
| افرم - ادرد | Tooth less | دەم و دان کەوتوو . دەم پووچ. |
| افزر | | سنگ دەرپەڕیو. |
| افساح | To give space | ماوە پێدان. |
| افست- افسنتين | Absinth = Worm weed | (ئەبسەنتیوم) ئەفسەنتین، جۆرە دەومنێکە گەڵاکەی لەگەڵای جاترە ئەچێت هەر لەزەوییەوە گەلێك لقی سەوزی باریکی لێ ئەبێتەوە، هەریەکە هێشووە گوڵێکی بۆری زەردی پێوەیە بۆنی خۆشەو تامی تاڵە، بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکار ئەهێنرێت. |
| افشاء | Spread | درکاندن، ئاشکراکردن. |
| افطس | Flat nosed | (فلات نۆز)، لووت پان. |
| افطح | Broad | پان. |
| افعى | Viper | (ڤایپەر) حەفی، حەفیان، شامار، ئەژدیها، ئەژدەهاك، ئەژدەر، ڕەش مار، جۆرە مارێکی گەورەیە سەرەکەی هێلکەییەو ژەهرینە. |
| افعى الشجرة | Tree viper | ماری درەخت، جۆرە مارێکە ژیانی بەسەر درەختەوە ئەباتە سەر. |
| افعى الرمل | Sand viper | ماری ناو لم، جۆرە مارێکە شاخێکی بچووکی هەیە بەسەر لووتییەوە لە باشووری ئەورووپا ئەژی. |
| افعى خبيثة | Viper | کوڵەوەبیاب، کوڵەمار، تیرەمار. |
| افعى نافخة | | مارێکی گەورەی سەرزل مل باریکی بەڵەکی ژەهراوییە. |
| افعوان | Viper = Adder = Crested lizard | مارمیلکەی پۆپنەدار، جۆرە گیاندارێکی سەیری خشۆکە درێژییەکەی نزیکەی "٨٠ سم"ە، پۆپنەی هەیە، ڕەنگەکەی سەوزە لە تەنیشتییەوە دووهێڵی هەیە یەکێکیان کاڵە ئەوی تریان ڕەشە، لە ئەمریکای ناوەڕاست ئەژی. |
| افعوان | Puff adder | (پوف ئادەر) جۆرە مارێکە خۆی فووئەدات. |
| افعال حيوية | Vitality actions | کارە زیندەوەرییەکان، کردارە زیندەوەرییەکان، زیندەکار. |
| افغم - افطس | Flat nosed | لووت پان |
| اف- صملاخ | Ear wax Cerumen | (ئیەرواکس) مۆمی گوێچکە، چڵکی گوێچکە. |

| | | |
|---|---|---|
| افق | Horizon | پۆ، ئاسۆ، سوێگه، کەناری ئاسمان. |
| افقی | Horizontal | پۆیی، ئاسۆیی. |
| افقم | Having an equal Jaws | شەویلگە درێژ. |
| افلات | Release | دەرباز کردن، ڕەوانەوە. |
| افلج= افليج | Paraly-sed | کۆڵ، گۆج، شەل و گێڕ، ئیفلیج، ڕینجۆ، گۆت. |
| افلج الاسنان | Inter sticed tooth | دان شاش، کەلەفیچ. |
| افلح | Harelip | "١" لچ داقڵیشاو. "٢" گێڕ، پەی‌زەن، یەکێك قاچی گێڕ بێت. |
| افناء | Destruction | لەناوبردن، فەوتاندن. |
| افنون= حية ذات اجراس | Rattle snake | (کروتالەس) ماری زەنگوڵەدار. |
| افنيك | Tail feather | پەڕی کلکی باڵندە. |
| افهام | To make one understand | تێ گەیاندن. |
| افول | Setting | ئاوابوون. |
| افوكـاتو- افوكاتـة- افوكادو- زبدية | A vocado | (ئەڤوکادۆ) درەختی پارێزەر، ڕووەکێکی گەورەی ئەمریکی هەمیشە سەوزە، بەرەکەی لە هەرمێ ئەچێت و ڕەنگەکەی سەوزەو بەڵام گەورەترە، تامی خۆشە و بەنرخە لە دروستکردنی کێك و شیرینی و شۆربا دا بەکاردێت لە ناوچە گەرمەکانا ئەڕوێ، گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی زەردە. |
| افواه- افاوية | Spices | بەهارات. |
| افوه | Bigmouthed | دەم زل، ددان زل، ددان درێژ. |
| افوسيت | Avocet | (ئەڤۆسێت)، باڵندەیەکی ئاوی‌ی لاق درێژە، دەنووکێکی ڕەشی درێژی، کەوانەیی هەیە بۆ سەرەوە. |
| افوميتر | Avometer | (ئەڤۆمیتەر)، دەزگایەکە بۆ پێوانی تەوژمی کارەبایی یان جیاوازی ئەرك "جهد" یان بەرهەڵستی کارەبایی. |
| افيت | Green marble | (ئوفیت) جۆرە مەرمەڕێکی سەوزی پەڵە پەڵەیە. |
| افيتامين | Avitamine | (ئەڤیتامین) نەخۆشی بەهۆی کەمی‌ی ڤیتامینەوە. |
| افيس- حشرة المن- ارقة | Aphis | (ئەفیس) مێش گەزۆ. |
| افيل | Yong camel | (یونگ کامێل) بەچکە ووشتر. |
| افيور | | (ئۆفیور) گیاندارێکی دەریایی‌یە چەند پەلێکی دڕکاوی هەیە لە کاتی ڕۆیشتندا ئەخشێت. |
| افيون | Opium | (ئۆپیۆم، پۆپی) دەومەنێکە ساڵی جارێك بەرئەدات، بە تۆو ئەڕوێت بەرەکەی وەك گوێزوایە مادەی تلیاکی لێ دەرئەهێنرێت. تلیاك مادەیەکی سڕکەرە، بریتی‌یە لە شیلەی ووشك کراوەی بەری ڕوومەکی خاشخاش، بە شێوەی تۆپەڵێك سوور یان قاوەیی هەیە بۆنێکی تیژو تامێکی تاڵی هەیە. ئەسڕەر، بەنگ، بافور، بێ هۆش دارو، ئاوێتەیەکە لە کاربۆن و هیدرۆجین و ئۆکسجین و نیترۆجین، ڕەق و سپی‌یە و ژەهرە کەمێکی بۆ پشووی مێشك باشە. |
| اقاقيا- سنط | Acacia | (ئەکاسیا) پاقلە مارانە، پاقڵەی دێوانە، دارجەوی، ئەکاکی، درەختێکە لە ناوچە گەرمەکانا ئەڕوێ لقەکەی دڕکاوی‌یە بۆنی خۆشە و گوڵی زەرد یا سپی یان پەمەیی ئەگرێ، بۆ بتەوکردنی زەوی بەکارئەهێنرێ، ڕەنگ و ڕیشاڵ و مادەی دەباخ کەری و زەمقی لێ‌دەرئەهێنرێت، تەختەکەی بە نرخە. |

| | | |
|---|---|---|
| اقب | Lean horse | ئەسپی لاواز. |
| اقة | Oke | (ئۆك) حۆقە، پێوەرێكە بۆ كێش، ئەكاتە نیو رەتل. |
| اقتراح | Suggestion | پێشنیاز، پێشتیاز. |
| اقتران | Conjugation | (كونجوگێشن) جووت گرتن، جووت بوون، نیمچە جووت گرتنێكە لە نێوانی دوو زیندەوەری یەك خانەیی بۆ مەبەستی زاوزێ. |
| اقتصاد | Economy | ئابووری. |
| اقتصادی | Economical | ئابووریی، ئابووری ناسی، ئابووری زان. |
| اقتصاد منزلي | Domestic economy |ماڵداری، دارایی ماڵ. |
| اقتراض | Borrowing | وام كردن، قەرز كردن. |
| اقتحام | Tobreak in to aplace | خۆتێ خستن، خۆتێ هەڵ قورتاندن. |
| اقتطاف | Gathering | دارنین، هەڵبچڕان، كردنەوە، چنینەوە. |
| اقتلاع | Extraction | هەڵكێشان. |
| اقتناص | Hunting | ڕاوكردن. |
| اقتفاء الاثر | Following the tracks of | شوێن هەڵگری، شوێن هەڵگرتن. |
| اقتباس | Quotation | لێ وەرگرتن. |
| اقتی- اقطی- قاتل البق | Actea = Elder | (ئەكاتیا) مێشوولە كوژ، جۆرە دەوەنێكە گوڵێكی مێشوویی سەوزی مەیلەو ئەرخەوانی ئەگرێت بەرەكەی لە دەنكە ترێ ئەچێت خڕو ڕەش و ژەهرە. |
| اقحوان- اذريون | Calendula | (كالیندولا، ماری گوڵد، دیزی) (ئەنیثیمیس) گیایەكی بۆن خۆشە گەلێك جۆری هەیە، هەمیشە بەهار گوڵە چاو ئێشە، بەیبونە كێویلە، جۆرە گوڵێكە لە بەیبونە ئەچێت زەردەو ناوەكەی ڕەشە، گوڵە ئاڵتونی. |
| اقحوان اصفر- عين القط- بهار حقلي | Corn chamomile | (كۆرن جامۆمیل) جۆرێكە لە بەیبون، چاوەپشیلە. |
| اقحام | To break into aplace | تێ ترنجاندن. |
| اقحوان الصباغين- عين الثور- بهار الصباغين- بابونج اصفر | Yellow chamomile | (یەلۆجامومیل) چاوە گا، بەیبونی زەرد. |
| اقحوان خمن- قحوان- ماروت | Anthemic cotula | جۆرێكە لە بەیبون بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| اقرار | Confession | دان پیانان. |
| اقرباذين | Pharmacology | (فارماكۆلۆجی)، زانیاریی دەرمان. |
| اقراض | Lending | وام دان، قەرزدان. |
| اقرع | Scaby headed | كەچەڵ. |
| اقرن | Horned | شاخدار. |
| اقرم | Cut nosed | لووت بڕاو. |
| اقزل | Limping | شەل. |
| اقزلان | | دوو پەڕەی ناوەڕاستی كلكی باڵندەیە. |
| اقسون- طوبة- فص الحمار- راس الشيخ | Wild artichoke | (وایلد ئەرتیچۆك) كەرتەشییە كێویلە، كنگرە كێویلە، گیایەكی پزیشكییە. |

| | | |
|---|---|---|
| اقصى | Moredistant | (١) دوورتر، ئەوپەڕی زۆرتر، (٢) گوێ بڕاو، کەسێك کە گوێی بڕابێت. |
| اقصليس | Oxalis=Sorrel | ترشۆکە، تروشکە، ڕووەکێکی کشتوکاڵییە، گەڵاکەی کەمێك ترشە، ئەکرێت بە چێشت. |
| اقصور | Oxyuriasis | (ئۆکسیریس) کرمی دەبووس، کرمێکی مشەخۆرە شێوەکەی لە دەرزی دەبووس ئەچێت لە ڕیخۆڵەی مرۆڤ و وولاخدا ئەژی. |
| اقط | Kishk | کەشك. جۆرێکە لە خواردەمەنی. |
| اقطبان- طولق | Waters soldier | (وتەرسۆلجەر) گیایەکە ڕەگەکەی سەلکدارە، گوڵەکەی پەمبەیی‌یە. |
| اقطع | One handed | یەك دەست، دەست بڕاو کوڵ، کۆترێك کەسکی سپی بێت. |
| اقطة- قانعته | Gizzard | سیقەتۆرە. |
| اقطاعية | Feudalism | دەرەبەگی. |
| اقطاعي | Feudal | دەرەبەگ. |
| اقعس | Pigeon breasted | سنگ دەرپەڕیو. |
| اقعم | Flat nosed | لووت پان. |
| اقفد | | (کاگنیوکس) یەکێك کە پاژنەی پێی بەرزبکاتەوە لە کاتی ڕۆیشتندا وە لەسەر پەنجەکانی بڕوات، پەیزەن، وولاخی پەیزەن کە هەردووسمی بۆ ناوەوە بێت. |
| اقلف | Circumcized | منالێك خەتەنە نەکرابێت. |
| اقليم | Climate | (کلایمێت)، هەرێم، کاڤار، وڵگە، زیدووبووم، ئاووهەوا، هەرێمی ئاووهەوا. |
| اقلاع | Pulling | هەڵکەندن، دەرکێشان. |
| اقلية | Mnority | "اقليات" کەمێتی، کەمینە. کەمایەتی. |
| اقلح | Tartar of teeth | ددان زەردە. یەکێك ددانی زەرد بووبێت. |
| اقمشة | Textile | قوماش، کوتاڵ. |
| اقنّخ- اقنثا- اقنثوس- مسمس- شوك اليهود- زغاف- شقف | Acanthus | (ئەکانثەس) ڕووەکێکی دڕکاوی‌یە، گەڵاکانی جوانە و گەلێك جۆری هەیە و هەندێکی بە کشتوکاڵ ئەکرێت و هەندێکیشی دەشتەکی و پزیشکی‌یە. |
| اقنى | Having an equilinenose | لووت باریك، لووت چەماوە، لووت گێڕ. |
| اقنف | Big eared | گوێ زل. |
| اقهب | Green wish black | ڕەشی مەیلەو سەوز. |
| اقونيطن | Aconitum | گورگ خنکێن، گیایەکی تەمەن درێژی ژەهرییە. |
| اكاب | Okapi | (اوکابی) گیاندارێکە لە ووشتر پڵنك ئەچێت. ملی کورتە، گیاندارێکی نایابە لە ڕووی زانیارییەوە، "ئوکابی". |
| اكاف-باهرة | Agave = americanaloe | سوبێری ئەمریکی، (ئەگاف)، جۆرە ڕووەکێکە گەڵاکەی گەورەو پان و گۆشتنە، قەدەکەی خۆڵەمێشی‌یە، قەراغەکەی دڕکاوی‌یە، گوڵەکەی وەك مێشوو وایە، جاری وا هەیە (١٠م) بەرز ئەبێتەوە. شیلەیەکی لێ دەرئەهێنرێت دژی گیری (گرفت) بەکارئەهێنرێت. |
| اكاسيا | Acacia | (ئەکاسیا) ئەکاکی، دارجەوی، پاقلەمارانە، پاقلە دیوانە، ڕووەنێکی دڕکاوی‌یە گوڵی سپی جوان ئەگرێت، کەتیرەی لێ دەرئەهێنرێت. |
| اكاسيا هندى | Indian acacia | خورمای هندی. |

| | | |
|---|---|---|
| اكار اكار | Agar - agar | (ئەگار ئەگار)، مادەیەکی لینجە لە هەندێ گژو گیای دەریایی دەرئەهێنرێ بۆ پەروەردەکردن و زاوزێ پێ کردنی باکتریا بەکارئەهێنرێت. |
| اكال- اكلة | Gangrene | (کەنگارینا) خۆرە، تیراوێ، برینێکی پیسە. |
| اكال الخشب | Termite=white ant | تەختە کالۆس، لیۆمنگ، قەرەونە، مێرووڵەی سپی. |
| اكاف- برذعة= قتب | Pack saddle | (پاك سادڵ) کورتان، کۆپان. |
| اكاف | Sadder | کورتان دروو، کۆپان دروو، پاڵان دروو. |
| اكاتوكس | | (ئیکاتۆکس) دەرمانێکە دژی کرم و مێرووی ڕووەك بەکاردێت. |
| اكاجو | Mahogany | (ماهوگانی) جۆرە تەختەیەکی بەنرخە ڕەنگەکەی زەردە کەلوپەلی لێ دروست دەکرێت. |
| اكار- فلاح- حراث- زارع | Farmer | (فارمەر، پلانتەر، کەڵتیڤێتەر) جوتیار. |
| اكال الذباب- مذباب | Fly catcher | (فلای کاچەر) مێش گر، جۆرێکە لە چۆلەکە مێش ئەخوات. |
| اكارنيا | Acarina | ئامرازێکی مۆسیقایە لەفەخفوری یان کانزا دروست ئەکرێت، بۆرییەکە هەشت کونی تیا هەیە. |
| اكارينا - قراديات | Acarina | (ئەکارینا)، کۆمەڵە مێش و مەگەزێکن لەسەر لەشی گیاندار ئەژین، گەنەیییەکان. |
| اكال- اكول- اكلة | Hearty eater | بخۆر، زۆرخۆر، خواردە. |
| اكبس | Megacephalic | سەرزل، کەللەزل. |
| اكتئاب- كابة | Depression | ماتی، ماتەمینی. |
| اكتراء | Renting | بەکرێ گرتن. |
| اكتية- كوهوش | Bane berry | (ئەکتیا) ڕووەکێکە گەڵاکەی ئاوێتەیە و گوڵەکەی سپی و بچووکە بەرەکەی سپی مەیلەو سوور یان ڕەشە و ژەهرینە. |
| اكتينوفورات | Actinophora | (ئەکتینۆفورا) کۆمەڵە گیاندارێکی دەریایییە، کە هەریەکەیان "٨" تاقم توێژاڵ "صفائح" یان هەیە بۆ جووڵانەوە وەك سەوڵ وان. |
| اكتينية | Actinism | (ئەکتینیزم) توانیی ووزەی تیشك لە پێکهێنانی گۆڕینی کیمیایی دا. |
| اكتينولوجيا | Actinology | (ئەکتینۆلۆجی) زانیاریی تیشکی ڕووناکی لە باری پێك هێنانی گۆڕینی کیمیایی دا. |
| اكتوپلازم | Ectoplasm | (ئەکتۆپلازم) سایتۆپلازمی دەرەوەی خانەی زیندوو. |
| اكتودرم | Ectoderm | (ئەکتودیرم) توێژاڵی دەرەوەی خانەی لەشی گیاندارە نزمەکان. |
| اكتشاف | Discovery | دۆزینەوە. |
| اكتوبر- تشرين الاول | October | (ئۆکتۆبەر)، مانگی دەیەم. |
| اكتناز "في الاقتصاد" | To treasure up | پەزمەندەکردن، خەزنەکردن. |
| اكتينيدية | Actinida | (ئەکتینیدیا، سیلڤەر ڤاین) دەوەنێکە گوڵێکی پرتەقاڵی ئەگرێت. |
| اكتينيوم | Actinium | (ئەکتینیۆم) توخمێکی کیمیاگەرییە کێشی ئەتۆمییەکەی "٢٢٧" و ژمارە ئەتۆمییەکەی "٨٩"یە ماناکەی "ئەکتینۆس" واتە "تیشك" ئەگرێتەوە نیشانەکەی (AC). |
| اكتين | Actin | پێوەری هێزی گەرمیی ڕۆژ. |
| اكتينوغرام | Actinogram | (ئەکتینوگرام) ئامرازێکە بۆ تۆمارکردنی ئەو گۆڕینە کیمیاگەرییانەی کە لە ئەنجامی تیشکی ڕۆژەوە ڕوو ئەدەن یا پەیدا ئەبن. |
| اكتينومتر | Actinometer | (ئەکتینۆمەتر) ئامرازێکە بۆ پێوانی هێزی تیشکی ڕۆژ و تیشکەکانی تر. |

| | | |
|---|---|---|
| اكتينوزوا- حيوان شعاعي | Actinozoa | (ئەكتینۆزوا) گیانداریکی تیشك دەرەوەیە. |
| اكتئاب | Depression | ماتی، ماتەمینی، دڵتەنگی، خەمۆکی. |
| اكتتاب | Subscription | پیتاك کردن، باربۆ. |
| اكثر | More | پتر، زۆرتر، زیاتر. |
| اكثرية | Majority | زۆربە، زۆرێتی زۆرینە. |
| اكثم | Cretin | گرگن، سیخن. |
| اكثيورنس | Ichthyornis | (ئەکسیۆرەنس) جۆرە باڵندەیەکی قڕتێکەوتووە. |
| اكثيسور- اكسيسور | Ichthyosaur | (ئەکسیۆسۆر) گیانداریکی دەریایی قڕتێکەوتووە لە ماسی چووە. |
| اكحل | Black eyed | چاو ڕەش، چاو کلاوی، چاو بە کل. |
| اكريلان | Acrilan | (ئەکریلان)، جۆرە ڕیشاڵێکی دەستکردە فەروو ڕاخەری لێ دروست ئەکرێت. |
| اكروسايد | Acroside | (ئەکرۆساید) دەرمانێکە بۆ لەناوبردنی مارومێرو. |
| اكر | Acre | (ئەکر) پێوانەیەکە بۆ زەوی ئەکا (٤٠٥٠م$^{2}$)، زەوی یەك ڕووبەرەکەی چوار هەزارو چل و هەشت مەتری چوار گۆشە بێت. فەدانی ئینگلیزی، بەرە جوت. |
| اكرار | Sunflower | گوڵە بەڕۆژە. |
| اكراه | Coercion = compulsion | زۆر لێ کردن. |
| اكرامية | Honorary | ڕێزانە، بەخشیش. |
| اكروباتيك- بهلوانيات | Acrobatic | (ئەکرۆباتیك)، تەنافبازی. پاڵەوانبازی. |
| اكريفلافين | Acriflavin | (ئەکریفلاڤین) دەرمانێکی زەردی پاکژکەرەوەیە لە قەترانی خەڵووز دەرئەهێنرێ بۆ چارەکردنی برین، پاکژکەرەوە، میکرۆب وەستێن. |
| اكزيما- قوباء | Eczima | (ئەکزیما، مۆیست تێتەر)، بیرۆ، والأمەنی، گەزەنەك، بیزۆك، سەوا، خارشت، گزنەك، بریتی‌یە لە نەخۆشی‌یەکی پێست،درم نی‌یە، لە نیشانەکانی خورو ئازارو سووربوونەوە، ئینجا پەیدابوونی بڵق یا قڵیشان کە شلەیەکی زەردی لینجی لێ دێتە دەرەوە، دوایی بڵقەکانی ئەبن بە زیبکە. |
| اكسير - حجر الفلاسفة | Elixir=Philosophers stone | "ئەلەکسیر" ئەکسیر، مایە، دەرمان، مادەیەکە کە گوایە ئەگەر بکرێت بەسەر کانزایی هەرزاندا ئەیکات بە کانزای گران و بەنرخ. بەردی فەیلەسوفەکان. |
| اكسير الحياة | Elixir of life | مایەی ژیان، نوشداڕو، دەرمانێکە پێشینان ووتویانە کە درێژە ئەدات بە ژیان. |
| اكسس | Small loothed | ددان بچووك. |
| إكس | | (ئێکس) جۆرێکە لە مراوی سەر گەورەو ملی باریك و جوانە. |
| اكسدة | Oxidation | ئۆکسیدکردن. یەك گرتنی مادەیەك لەگەڵ ئۆکسجین دا. |
| اكشم | Cut off nosed | لووت بڕاو. |
| اكشوت | Cuscuta | (سۆدەر) گورگە، گیاکەڵە، ڕووەکێکی بێ گەڵای مشەخۆرە، زۆر تاڵە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| اكصور | Khthyosaun | (ئەکسیۆسۆر) گیانداریکی دەریایی قڕ تێکەوتووە لە ماسی چووە. |
| اكل النحل | Bee eater | هەنگ خۆرە، هەنگۆچنە، قاژەقاژە، ئەسپە شینە، ڕەنگاڵە، خەنجەریاڵ، کەنەسمە، جۆرێکە لە باڵندە. |

| | | |
|---|---|---|
| آكل | Eater | خۆرا، بخۆر. |
| اكلان | Prurigo | (پیرۆریگۆ)گەڕی، نەخۆشی‌یەكی پێستە توشی مانگا نەبێت. |
| اكلف | Freckled | دەم و چاو پەڵاوی، دەم و چاو ماڵاوی. |
| إكليل | Crown | زەرەوەرەق، چەپكە گوڵی كاغەز، چەپك. خاكەزەر، شەلایی، شەوە، گوڵبەند. |
| إكليل الملك، عرار قيصری | Crown imperial=fritillaria | كنێرە، شلێر، گوڵێكی سوور دەگرێت لە زەنگۆڵە دەچێت شۆڕ دەبێتەوە، شاگوڵبەند، گوڵبەندی پاشا، بۆ خۆشكە، بریتی‌یە لە دوو جۆرە ڕووەك، یەكێكیان گەڵاكەی لە گەڵای شملی ئەچێت، بۆنی گەڵای هەنجیری لێ‌دێت، سەری هەر لقێكی گوڵبەندێكی نیوە بازنەیی زەردی پێوەیە، دووەمیان لقەكانی بەسەر زەویدا ئەخشێتو گەڵاكەی لە گەڵای نۆك ئەچێت گوڵەكەی زەردو سپی‌یە سەری هەر لقێكی گوڵبەندێكی بازنەیی پێوەیە و ئاووكەكەی ژەهرینە. |
| اكليل الشمس. | Corona | (كۆرونا) خەرمانەی ڕۆژ. خەرمانە، ئاخڵە، جێژ، جۆخیینە. بریتی‌یە لەبەرگێكی گازی ئایۆنی زۆر گەرم دەوری ڕۆژی داوە. |
| إكليل الزهور | Garland | چەلینگ، باقەی گوڵ، چەپكێك گوڵ، گوڵبەند. |
| اكليل شوكی | Crown of thorn | (كرۆون ئۆف تورن) گوڵبەندی دڕك، جۆرێكە لە ڕووەكی شیرمار بە شێوەی دەوەنێكی دڕكاوی گوڵەكەی سوورە. |
| اكليل الجبل - قرمانا = حصا البان - ندی البحر | Rosemary | (ڕۆزماری، كۆمۆن ڕۆزماری، ڕۆزماری ئاسایی)، گوڵبەندی شاخی، گیایەكی تەمەن درێژی هەمیشە سەوزە، لقی زۆری لێ نەبێتەوە، لقەكانی زبرن، گەڵاكانی تاڵ و دەزوولەیی مەیلەو ڕەش و بۆن خۆشن، لەگەڵ خواردەمەنی ئەخورێت، هەروەها ڕۆنی ڕۆزماری لێ‌ئەگیرێت، بەرمكەی وورە بۆ مەبەستی پزیشكی و بەهارات بەكاردێت، ئاورنگی دەریا، شەونمی دەریا. |
| اكليلة المروج | Spiraea | مەجریسووك، دەوەنێكە لقەكانی دەكرێن بە گوڵبەند. |
| آكلة | Canker | (كانكەر) خۆرە، سنان، نەخۆشی‌یەكی ڕووەكی‌یە لە جۆرە كەڕوویەكەوە ئەبێت. |
| آكل النمل | Ant eater | (ئەنت ئیتەر) میرووڵەخۆر، گیاندارێكی شیردەری بێ ددانی مێرووڵەخۆرە، بە زمانی مێرووڵە ئەگرێت و ئەیخوات سەری درێژ و باریكە. |
| آكل الشعير | Barley eater | جۆخۆرە، زردەوەلی، باڵندەیەكی زۆر بچوكی جۆخۆرە. |
| آكل العسل | Ratel | (ڕاتل)، هەنگوین خۆرە، هەنگ خۆرە، گیاندارێكە لە چوالوو ئەچێت. |
| آكل السمك | Loon | (لوون) ماسی خۆرە، كەرسەرە، پێ‌درێژە جۆرە باڵندەیەكە لە مراوی ئەچێت. |
| آكل الجيف | Carrion eater | لاشەخۆر، داڵی كەر خۆر. |
| آكل الحبوب | Grain vorous | (گرینیڤۆرەس) دانەوێڵە خۆر، دان خۆر. |
| آكل الثمر | Frugivorous | (فروگیڤۆرەس) گیانداری میوەخۆر. |
| آكل الحيات | Snake eater | جۆرێكە لە لەفیلەگێژە مار ئەخوات. |
| آكلة الاعشاب | Herbivorous | گیاخۆر. |
| آكلة الحشرات | Insectivorous | (ئینسیكتیڤۆرەس) مێروخۆر، جانەوەر خۆر، گیانداری مێروو خۆر. |
| آكلة اللحوم - لواحم | Carnivorous | (كارانیڤۆرەس) گۆشت خۆر. |
| آكل لحم البشر | Man eater | خۆخۆر، مرۆڤ خۆر، گۆشتی مرۆڤ خۆر. |
| اكل | Canibal | خواردن، خواردەمەنی. |
| إكلة | Great ibex | بزنە كێوی گەورە. |
| اكلينيك- عيادة طبية | Surgery Clinic | (سەرجەری) خوێندنی وانەی پزیشكی لەسەر نەخۆشی. |

| | | |
|---|---|---|
| إكليل بوقيصي | Spiraea | (سپیرایا) گیایەکی بەرزە، قەدەکەی مەیلەو سورە، گوڵەکەی سپی و مەیلەو زەردە بۆنی بایەفی تاڵی لێ دێت. |
| اكمة | Hill | (هیڵ) گرد. |
| اكمد | Dusky=Swarthy | ڕەنگی خۆڵەمێشی. |
| اكمش | Short Leged | پێ کورت، قاچ کورت. |
| اكملة- ابجدية | Alphabet plant | (ئەکمیلا، ئەلفابێت پلانت) ڕووەکی ئەلفبا، گیایەکی دەشتەکی‌یە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| اكنة | Achene | (ئەچین) بەرێکیووشکی یەك تۆوە وەك بەری بایەف و فنق. |
| اكنع | | کۆڵ، گۆج، دەست براو. |
| اكهب | Black brown | قاوەیی مەیلەو ڕەش، زەردی مەیلەو سوور، وێن، سووری مەیلەو زەرد. |
| اكواريوم | Aquarium | (ئەکواریوم) جۆرە حەوزێکە ئاوی تێ ئەکرێت و ماسی و گیای ئاوی تیا پەروەردە ئەکرێت. |
| اكورديون | Accordion | (ئۆکوردیۆن)، ئامرازێکی مۆسیقەیە قەد ئەکرێت. |
| اكوفون | | (ئەکۆفۆن) ئامرازێکی کارەبایی‌یە، یارمەتی کەڕ ئەدات بۆ بیستن. |
| اكول | Hearty eater | خۆرا، زۆر خۆر. |
| اكولة | Fattened | دابەستە. |
| اكونيت- اقونيطن - انتله- قلنسوة الراهب - خانق الذئب- قاتل النمر | Aconite | (ئەکونیت) گیایەکی ژەهرینە، گورگ خنکێن. |
| اكوه | Wild cow | جۆرێکە لە مانگا کێوی. |
| اكويلارية | Incense tree | جۆرێکە لە درەختی داری بخورد "بفورد". |
| اكوامارين | Aquamarine | (ئەکوامارین) زەرووتی شینی کاڵ، جۆرە بەردێکی بەنرخە. |
| اكيدنيا- ايكي‌دينا - مشملة - يابانية - مستكاوى - رازيان - باكير | Loquat = Japanmedlar | (لۆکوات، چاپان مێدلار) یەنگی دینا، درەختێکە بەرەکەی بەشێوەی هێشووە ڕەنگێکی پرتەقاڵی هەیە، تامی خۆشە لە ناوچەی دەریای ناوەڕاست ئەڕوێت. |
| اكيلاجيا - انكولية كولمين | | (ئەکویلیجیا) گیایەکی دەشتەکی‌یەو گەڵاکەی گەورەیە گوڵێکی جوانی هەمەڕەنگی هەیە. |
| اكياس هوائية | Air sacs | (ئێرساکس) تورەکە هەوایی‌یەکان، چەند تورەکەیەکن لەلەشی باڵندەدا بەستراون بە کۆئەندامی هەناسەوە هەوایان تیایە. |
| اكياس مائية | Echinococcus | نەخۆشی‌یەکە توشی ئادەمیزاد ئەبێ و ئەبێ بەهۆی پەیدابوونی جۆرە کیسەیەك لەسەر جگەر یان سی، کرمیووردی تیایە، بەهۆی گەستنی سەگ، یان قاپ و دەوری کە سەگ بیلێسێتەوەو ئادەمیزاد بەکاری بهێنێت بڵاوئەبێتەوە. |
| الأباستر | Alabaster | (ئەلاباستەر) جۆرێکە لە گەچ پەیکەری لێ دروست ئەکرێت. |
| الأرية | | (ئەلاریا) ڕووەکێکی ئاوی‌یە. |
| الامية زهرة الألام | Passion flower | (پێشن فلەوەر) گوڵەئێشە، گیایەکی دەشتەکی‌یە بەرەکەی هێلکەیی‌یەو ئەخورێت، گوڵە سەعات. |
| الأكثر | More and more | هەرە زۆر. |
| الام الطلق | Travial=Throes of child birth | بەرمژان، ژان گرتنی ئافرەت. |

| | | |
|---|---|---|
| الابعاد الثلاثة | | سێ دووری‌یەکە درێژی و پانی و بەرزی. |
| الاءة | Oleander | درەختێکە هەمیشە سەوزە بەرەکەی تاڵە، ژاڵە. |
| الات الرصد الجوي | Observation articles | ئامرازەکانی ڕووانینی دیدەوانیی هەوایی، بریتین لە تاقمە ئامرازێك بۆ نیشاندان و پێوانی تیشکی ڕۆژ و گەرمی و شێ و هەورو باران و بەفرو ڕەشەباو هەورە تریشقە و تەرزەو سەهۆڵ و ئاوونگ پاڵەپەستۆی هەوا.. هتد. |
| الأس الهيدروجيني | PH value | (پێ ئێچ ڤالیو)، پێوەری توندی یان خەستی ئایۆنی هایدرۆنیۆم واتا پێوەری ترشی یان تفتی گیراوەیەك. |
| البومين | Albumen | (ئەلبۆمین)، پرۆتینی هێلکە. |
| البان | Diary | شیرەمەنی. |
| البيزيا- لنج | Albizzia | (ئەلبیزیا) داری نوێنمەك، درەختێکە. |
| إلب | | (ئیلب) درەختێکی دڕکاوی‌یە لە کەبات ئەچێت. گەلێ جۆری هەیە، ناسرلوەترینیان ئەو جۆرەیە کە پێی ئەووترێ "نیوەنمەك" وە لە بەسرە ئەروێ، درەختێکی مام ناوەنجی‌یە گەڵاکانی لە زستاندا ئەوەرێ بۆ باخچەو سەرشەقامەکان بەکارئەهێنرێ، گەڵاکانی ئاوێتەیە، لەسەرەوە بەشێوەی لوتکەیەکە، گوڵەکانی زەردی مەیلەو سەوزن کەمێك بۆنیان هەیە بەشێوەی هێشوو شۆڕ ئەبنەوە، لە هاوین و پایزا بە قەڵەم و تۆو زیاد ئەکات. |
| البوب | | (ئەلموند) ناووکی بایەف و قەیسی. |
| البوقير | Hornbill | باڵندەیەکی دەنوك زلە. |
| الباستر | Alabaster | (ئەلباستەر) جۆرە گەچێکی سپی‌یە بۆ دروستکردنی پەیکەر بەکاردێت، مەرمەڕ. |
| البكا = البكة | Alpaca | (ئەلپاکا) جۆرێکە لەلاما، گیاندارێکی ماڵی‌ی کاوێژکەرە لە ئەمریکای باشووری ئەژی لەمەڕ ئەچێت، خوری‌یەکەی درێژو ئەرمە سوودی لێ وەرئەگیرێت. |
| البوم | Album | (ئەلبووم)، دەفتەرێك بۆ کۆکردنەوەی پوول و وێنە. |
| البوغلصن- لسان الثور | Anchusa = bugloss | بنەگۆزروان. ڕووەکێکە گەڵاکەی لە زمانە گا ئەچێت |
| البيزيا- لبخ - شجرة الحرير | Silk tree | (ئەلبیزیا) دەوەنێکە لە ئەکاسیا ئەچێت کەمێك دڕکاوی‌یە، بەرەکەی لە پاقلە ئەچێت. |
| البقعة الصفراء | Yellow spot | "یەلۆسپۆت" پەڵەیەکی پچووکی زەردە لە ناوەڕاستی تۆڕی چاودا، لەو پەڵەیەدا باشترین بینین ڕوو ئەدات. |
| البقعة العمياء | Blind spot | "بلایندسپۆت" شوێنێکە لەسەر تۆڕی چاو بینینی تیا ڕوو نادات. |
| الة | Article= instrument | مەکینە، ئامێر، ئامراز، دبیش، مەراز، ئالاو. |
| الة البذار | Sowing Machine | مەحلی. |
| الة النسيج | Textile Machine | ئامێری چنین تەون، بەفش، تەڤن. |
| الى | Mechanical | ئامێری. |
| الة قاطعة | Cutting Instrument | ئامرازی بڕەر، ئامرازی بڕندە، تیغ،ئامێری بڕین. |
| التفات | Turning round | ئاوڕدانەوە. |
| الة التصوير | Camera | (کامێرا، فۆتۆگراف)، ئامرازی وێنەگرتن. |
| الة الاطفاء | Exting uishing | ئامرازی کوژاندنەوە. |
| الة الحياكة | Knitting Machine | تەون، دەزگای چنین، بەفش، تەڤن. |
| الة حاسبة - حاسبة الكترونية | Computer | (کۆمپیوتەر) پیژمار، ئامێری ژمێرەر، ئامێری ژماردن. |

| | | |
|---|---|---|
| انهاك | Exhaustion | شەکەت، ماندوو بوونی زۆر، کەشەنگ. |
| انهيار | Collapse | تلیسانەوە، ڕووخان، ڕمان، هەرەس هێنان. |
| انهاء | Finishing | دواهێنان، کۆتایی پێ هێنان. |
| انهماك | Entire | خەریك بوون، خەڵەفاندن. |
| انهدام | To be destroyd | تەپین، ڕوخان، ڕمان. |
| انوق | Egyptian vultunec | (ئۆتۆگییس) داڵەکەرخۆرە، داڵاش، پیرۆزە، کەرخۆرە. جۆرێکی کەتەیە لە سیسارکە کەچڵە ڕەنگی خۆڵەمێشی و دەنووکی زەردە. |
| انوار كشافة | Searchlight | ڕووناکی ئاشکراکەر، شەوق هاوێژ. |
| انوثة | Fefinity | ژنێتی، مێیی. |
| انواء جوية | Meteoric | بەختە باران، بەختە هەوا، ئاوو هەوا، هەوا شوناسی، کەشی هەوایی، باری کەش. |
| انود | Anode | (ئەنود) لەوحێکی گەرمە ئەلەکترۆن ڕائەکێشێ لە بۆری بەتاڵکراوە لە هەوا. |
| انوده | | (ئەنودە) گیایەکە گوڵێکی مۆر ئەگرێت. |
| انوار الشمال - شفق قطبي | Aurora = borealis | (ئۆرۆرا) ڕووناکی باکوور، گزنگی پیتەیی، گڕێکی ڕەنگینی جوانە لە ئاسماندا پەیدا ئەبێ و هەندێ جار ئەلەرێتەوە و دەنگیشی لە گەڵایە. |
| انوفيلس | Anopheles | (ئەنۆفیلس)، مێشوولەی لەرزو تا بە ئادەمیزاد ئەگەیەنێ و بڵاوی ئەکاتەوە. |
| انوبس | | جۆرە مەیموونێکە بەسەریا لەسەگ ئەچێت. |
| انيام= ديسقوريا = بطاطة صينية | Yam | (یام، دایۆسکۆریا)، ڕووەکێکی سەلك دارە، گەڵاکەی وەك دڵ وایە و گوڵەکەی بچووکە، سەلکەکەی شیرینەو دوای کوڵاندن ئەخورێت - پەتاتەی چینی. |
| انيق | Elegani = handsome = Toff | قۆز، ڕێك و پێك، شۆخ. |
| انين | Groaning | نووزە، بزکە، ناڵاندن، ناڵین، زووکە، زووکە زووك. |
| انيمومتر | Anemometer | (ئەنیمۆمەتر)، دەزگایەکی تایبەتی‌یە بۆ پیشاندانی هێزو ڕێ ڕەوو خێرایی با. |
| انيسون- يانسون - كمون = حبة حلوة | Aniseed | (ئەنیسید، ئەنیس، سویت کیومین) ڕازیانە، هەبۆسـان، بەهاراتێکی بـۆن خۆشـە دەنکەکـەی ئەکرێتـە شـیرینی و مەیـوەوە. دوو جـۆر گـەڵای هەیـە گوڵەکەی لە شێوەی چەترێکی سپی‌دایە. |
| انيلين | Aniline | (ئـەنیلین) ئاوێتەیەکـە لـە کـاربۆن و هـایدرۆجین و نیـترۆجین پێکـهاتووە، شلەیەکی چەوری بێ ڕەنگە لە چویت و قەتران و خەڵوز دەرئەهێنرێ بۆ دروستکردنی ڕەنگ و پلاستیك و گەلێ شتی تر بەکار ئەهێنرێت. |
| انيس - قيق - زرياب | Jay | باڵندەیـەکی چـاوتیژی ئاوییە دەنگی لـە دەنگی مانگا ئـەچێ و پەڕەکـەی ئاڵتوونی‌یە، میلی ڕەشی تیایە، لەش و قاچی کورتە و ملی درێژە. |
| انيمون- شقار - شقائق النعمان | Anemone | (ئەنیمۆن) گوڵاڵە سوورە ڕووەکێکی پیازییـە، سـەلکی هەیـەو زسـتانەیە گوڵێکـی جوانـی هەیـە و پـێی دەوورتـرێ گوڵاڵـە سـوورە ڕەنگـی سـپی و سوورو پەمبەیی و ئەرخەوانی و بنەوشەیی شینی هەیە. |
| انيميا | Anemia | (ئەنیمیا) کەم خوێنی خوێن کەمی. |
| اهاب | Skin | پێستە، کەوڵ. |
| إهتزاز | Vibration | لەرینەوە، شەکین، هەژیف، شەکانەوە، لەرانەوە. |
| إهتزاز تموجي | Wavy vibration | لەرینەوەی شەپۆلی. |
| اهتمام | Concern | خەمخواری، دەربەست هاتن، بەتەنگەوە هاتن. |
| اهثم | Toothless | بێ ددان، دەم پووچ. |

| | | |
|---|---|---|
| اهداب | Cilia | (سیلیا) کوڵك، برژانگ، هەندێك مووی باریکن بە ڕووی دەرەوەی خانەوە یارمەتی ئەدەن بۆ جووڵانەوە وەکو لە پەرامیسیۆم دا. |
| أهدل | Flowing lip | لچە، لچ شۆڕ، لچ ئەستوور. |
| اهرام | Pyramid | مەمیلەی بۆری میز لە گورچیلەدا. |
| اهرث | Wide mouthed | دەم زل. |
| اهل | Family | خێزان، دانیشتوان، خەڵك، کەسوکار. |
| إهلاك | To des troy | فەوتاندن، بە فەتارەت بردن. |
| اهليلج | Myrobalm | (تێرمینالیا) هەلیلە، بەری درەختێکی هیندییە ڕەنگەکەی زەرد یا ڕەشە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکار دێت. |
| اهليلجي= القطع الناقص | Elliptical | هێلکەیی، شێوەی هێلکەیی بەڵام دوو جەمسەرەکەی خڕێکی ڕێك و پێکە. |
| إهمال | Omission | کەم تەرخەمی، "گوێ پێ نەدان". |
| اهمية | Importance | گرنگی. |
| اهوَج | Reckless | کەللەرەق، سەرچڵ، هەڵەشە. |
| اهوكاتية- ابوكاتيه- ابو كادو- ابوكة- اهوكة- ابوكاة | Avocado | (ئەڤوکادۆ) درەختێکی بەرزی جوانە لە کۆمەڵەی زەیتون، بەرەکەی لە هەرمێ ئەچێت، ڕەنگەکەی سەوزی بنەوشەییە ئەخورێت و بۆ دروستکردنی خواردەمەنیش بەکاردێت. |
| اهيف | Slim=slender | باریك، قەد باریك. |
| اهيق | Tall necked | مل درێژ، زۆر درێژ. |
| آهين | Cast iron | حەوجۆش، ئاسنی دارشتن. |
| اوار | Heat | گەرما، گەرمایی. |
| اواني مستطرقة | Communicating vessles | قاپە بە یەکەوە نووساوەکان، قاپە هەمە جۆرەکان، دەفرە پێچ پێچەکان. |
| اواكاري- براكيورس | | (ئواکاریی) جۆرە مەیمونێکی ئەمریکییە. |
| اوابد | Sedentary | (سیدینتاری) باڵندەی نیشتەجێ. |
| اوب= نحل | Bee | (بیی) هەنگ. |
| اوبيليا | Obelia | (ئۆبیلیا)، گیاندارێکی ئاویی ساکارە. |
| اوبوبانكس - جاوشير | Opo parrx | درەختێکە گوڵەکەی زەردە جۆرە زەمقێکی لێدەرئەهێنرێ بۆ مەبەستی پزیشکی. |
| اوبَر | Ruffle | جۆرێکە لە دومەڵان تووکنە ڕەنگەکەی لە ڕەنگی خۆڵ ئەچێت و تامی ناخۆشە لە تامی شێلم ئەچێت. |
| اوبرا | Opera | (ئۆپێرا)، چیرۆکی شانۆگەری بە مۆزیقە یان بە گۆرانییەوە. |
| اوباش | The rable | مرۆڤی خراپ. |
| اوبوا- مزمار | Clarionet | زوڕنا. |
| اوتوماتيك | Automatic | (ئۆتۆماتیك)، خۆکاری، جووڵەی خۆیی، جمەی خۆیی، دەزگایەکە یاخود ئامرازێکە لە خۆیەوە ئیش ئەکات. |
| اوتوبيس | Auto bus | ئۆتۆمبیل، "پاس، باص". |
| اوتوكلاف | Autoclave | (ئۆتۆکلاف)، ئامرازی کوشتنی میکرۆبە بە هۆی هەڵمەوە. |
| اوتوستراد | Autostrad | (ئۆتۆستراد) ڕێگەیەکی تایبەتییە بۆ هاموشۆکردنی ئۆتۆمبیل. |
| اوتوقراطي | Autocrat | (ئۆتۆکرات)، زەوال، زاڵم، ئەو کەسەیە کە دەستەڵاتێکی تەواوی هەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| اوتوقراطية | Autocrasy | (ئۆتۆكراتی)، حوكمێكی پەتی، دەسەلاتێكی پەتی. |
| اوتوجيرو | Autogiro | (ئۆتۆجیرۆ)، جۆرێكە لە فڕۆكەی هیلیۆكۆپتەر. |
| اوج | Apogee | ئەوپەڕ، شوێنی مانگ یان ئەستێرەیەكی گەڕۆك لە سوورگەكەدا لەو كاتەدا كە لەوپەڕی دووری دابێت. |
| اوج | Apogee | (ئەپۆج) ئەوپەڕ، تاف، بڵندی، پۆپە، بەرزترین شوێن، دوورترین شوێن. |
| اوج شمسي | Sotar apogee | (ئەفیلاین)، دوورترین بەشی سوڕگەی ئەستێرەیەك لە ڕۆژەوە. |
| اوجه | Unproductive | (ئەنپرۆ دەكتیڤ) بێ بەر = زڕ. |
| اودو | | جۆرە گیایەكە ڕەگەكەی گۆشتنەو ئەخورێت. |
| اودع= يربوع - جربوع | Jerba | (جیربا) گۆڕ هەڵكەنە. گیاندارێكی قرتێنەری بازدەرە كلكو قاچی درێژن. |
| اوديما- اوذيما- وزقة | Oedema | (ئیدیما، ئۆدیما)، كۆبوونەوەی شلاوێكی زۆر لە شانەو بۆشاییەكانی لەش دا، ئاوبەنگ. |
| اوديما الاجفان | Eyelid oedema | ئاوسان، ئاوسانی پێڵوو. |
| اوراق الاعتماد | Credintial | بڕوانامە. |
| اورانك- ئوتان- انسان الغاب | Orang outang | جۆرێكە لە مەیموون، لە مرۆڤ دەچێت لە بۆرنیو و سۆمەترەدا دەژی. |
| اوركسترا | Orchestra | (ئۆركسترا) سازبەند، سازو سەمتور، تیپی مۆسیقا. |
| اورانيوم - يورانيوم | Uranium | (یۆرانیۆم)، كانزایەكی تیشكدەرە بۆ دروستكردنی بۆمبای ئەتۆمی بەكاردێت كێشی ئەتۆمیەكەی ٢٣٨,٠٧ و ژمارەی ئەتۆمیەكەی (٩٢). نیشانەكەی (U)ە. |
| اوروبا | Europe | (ئەورووپا) یەكێكە لە پێنج كەرتە "كیشوەر" كە لە خۆرهەلاتەوە بە ئاسیا و لە باكوور خۆرئاوا باشورەوە بە دەریای بەستەڵەكی باكووری و زەریای ئەتڵەسی "دەریای باكوورو دەریای باڵتیكی لێ جیا ئەبێتەوە" وە دەریای ناوەڕاست دەورە دراوە. |
| اوريومايسين | | (ئۆریۆمایسین) دەرمانێكی تازەیە بۆ چارەسەركردنی هەندێك نەخۆشی وەكو دیزانتری بەكاردێت. |
| اورلون | Orlon | (ئۆرلۆن)، ڕیشاڵێكی دەستكردە بلوزی پیاوانەی لێ دروست ئەكرێت. |
| اوربيتال | Orbital | (ئۆربیتاڵ)، كەلێنێكە لە بۆشایی دەرەوەی ناوكی ئەتۆم دا، ئەلیكترۆنێك یان دوو ئەلیكترۆن زۆربەی وەختەكەیانیان تیایا ئەبەنەسەر. |
| اوريكتولوجيا | | (ئۆریكتۆلۆجیا) زانستی كانزا بەردینەكان. |
| اوريليا | | (ئۆریلیا) جۆرە گیاندارێكی ساكارە لە قەراغی دەریادا ئەژی. |
| اور | Fire place | ئاگردان. |
| اوربيوم Eu | Europium | (ئۆرپیۆم، یۆرپیۆم) كانزایەكی كیمیاگەرییە كێشی ئەتۆمیەكەی "١٥٢"و ژمارەی ئەتۆمیەكەی "٦٣"یە، كانزایە، ماناكەی "یوروب" واتە "ئەورووپا" ئەگرێتەوە. |
| اورانوس | Uranus | (ئەورانووس)، حەوتەم ئەستێرەی گەڕۆكە لە نزیكیدا لە ڕۆژەوە، وە یەكەم ئەستێرەی گەڕۆكە كە دۆزراوەتەوە بە تەلیسكۆب، نزیكەی "١٤/٧"ی خڕۆكی زەوی ئەبێت، "١٧٨٥" ملیۆن میل لە ڕۆژەوە دوورە، تیرەكەی (٣٢) هەزار میلە، بە (٨٤) ساڵ یەك جار بە دەوری ڕۆژا ئەسوڕێتەوە. |
| اوروم | Aurum | "ئۆرۆم" زێڕ، ئاڵتون، كانزایەكە ژمارەی ئەتۆمیەكەی (٧٩) و كێشی ئەتۆمی (١٩٧)ە بۆ دروستكردنی خشڵ و پارە بەكار ئەهێنرێت. نیشانەكەی (Au)ە |

| | | |
|---|---|---|
| اورغندي | Organdy | "ئۆرگاندی" جۆرە قوماشێکی موسلینی تەنکی ڕوونە. |
| اورطي | Aorta | (ئۆرتا)، شاخوێنبەری لەش. |
| اورستد | Oersted | (ئۆرستد) یەکەی پێوانی هێزی موقناتیسی. |
| اوز | Goose=Swan | قاز، ئۆردەك. |
| اوز العراق | Swan | (سوان) قازی عیراق. |
| اوزينا | Ozena | بۆگەنی لووت. |
| اوزونوسفير | Ozonosphere | (ئۆزۆنۆسفێر) چینێکە لە چینەکانی هەوای دەوروپشتی زەوی بەرزاییەکەی (٢٠-٣٠) میلە، ڕادەیەکی زۆر لە ئۆزونی تیایە. |
| اوزونيوم | Ozonium | (ئۆزۆنیۆم) جۆرە کەڕوویەکە نەخۆشی ڕووەك بڵاوئەکاتەوە، وەك لە لۆکەدا. |
| اوزوكريت | Ozokerite | (ئۆزۆکریت)، مۆمی کانزایی، مۆمنایی، مۆمێکی پارافینی کانزاییە، ڕەنگێکی زەردی تۆخ یان بۆز یان ڕەشی هەیە لە نەوت دا ئەتوێتەوە، کە ڕەنگەکەی لابرا پێی ئەووترێت "سێریسین". |
| اوزول | | (ئیوسۆڵ) دەرمانێکە بۆ قەڵاچۆکردنی مێرووی زیان بەخش. |
| اوزة حمراء | Flamingo | سوورە قاز، سوورە قوڵنگ. |
| اوزون | Ozon | (ئۆزۆن) گازێکە لە تێپەڕکردنی تیشکی کارەبا بە هەوادا دروست ئەبێ، مۆلیکیولەکەی لە "٣" ئەتۆمی ئۆکسجین پێکهاتووە، ڕەنگەکەی مەیلەو شینە، بۆ پاکژکردنەوەی هەواو ئاوی خواردنەوە بەکاردێت نیشانەکەی ($O_3$). |
| اوس | Wolf | (وڵف)، گورگ. |
| اوسلتوريا | Oscillatoria | (ئۆسیلاتوریا) قەوزەیەکی شینی مەیلەو سەوزە. |
| اوسميوم- اوصميوم (اوزميوم Os) | Osmium | (ئۆسمیۆم) توخمێکی کیمیاگەرییە کێشی ئەتۆمییەکەی "١٩٠/٢" و ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٧٦) کانزایەکی ڕەنگ خۆڵەمێشییە، ماناکەی (ئوسم) واتا (عەتر) ئەگرێتەوە، بۆ پتەوکردن و قایم کردنی پلاتین بەکاردێت. نیشانەکەی (Os)ە. |
| اوسايت | Oocyte | (ئووسایت) جۆرە خانەیەکی زیندووە دوای دابەشبوونی ئەبێت بە گەرا. |
| اوسبور | Oospore | (ئۆسپۆر) سپۆرێکی دیوار ئەستوورە لە دەوری مت بوون دا. |
| اوستراليا | Australia | (ئوسترالیا) یەکێکە لە پێنج کەرتەکە بە زەریای هێمن و زەریای هیندی دەورە دراوە. |
| اوسط - منتصف | Middle | ناوەڕاست. |
| اوشع | Squirrel | سمۆرە، سنجاو. |
| اوعية دموية | | بۆرییە خوێنینەکان، بۆری خوێنین، بۆرییەکانی خوێن. |
| اوعية شعرية | Capillary tubes | بۆری دەزوولەیی. |
| اوعية شعرية دموية | Capillary tubes | بۆری دەزوولەیی خوێنین. |
| اوفاريقون- هيوفاريقون | Hypericum | (سانت جۆنس ۆرت) ڕووەکێکی دەشتەکی و کشتوکاڵی و پزیشکییە. |
| اوفريس | Ophrys | (ئۆفریس) ڕووەکێکی سەلکدارە گوڵەکەی لە هەنگ و زەردەواڵە ئەچێت. |
| اوفسيت | Offset | (ئۆفسێت) ڕێگەیەکە بۆ وێنەگرتن لەسەر لاستیك لە دواییدا ئەگوێزرێتەوە بۆ سەر کاغەز. |
| اوقيانوغرافيا | Oceanography | (ئۆشنۆگرافی) زانیاری زەریاکان لقێکە لە زانست، باسی شێوەو ناوەڕۆکی زەریاکان ئەکات. |

| | | |
|---|---|---|
| اوقية، وقية | Ounce | (ئۆنس) پێوانەیەکە بۆ کێش، ۱۲/۱ی ڕەتڵێك. |
| اوقية مائعة | | پێوانەیەکە بۆ قەوارە ئەکاتە ۲۸/٤ سم³. |
| اوقيانوس - محيط | Ocean | (ئۆشن) زەریا. |
| اوك | auk | باڵندەیەکی مل و باڵ کورتە لە دەریاکانی باکورا ئەژی. |
| اوكسجين O | Oxygen | ئۆکسـجین، توخمێکـی کیمیاگـەری ناکانزایـە، کێشـی ئـەتۆمی "١٦" و ژمارەکەی "٨"ە، گازێکی بێ ڕەنگە، پەیداکەری ترشییە. |
| اوكسجين طري | Fresh oxygen | ئۆکسجینی تازە. |
| اوكسي هيموغلوبين | Oxyhymoglobin | (ئۆکسی هیمۆگلۆبین) بریتییە لە هیمۆگلۆبینی ناوخوێن ئۆکسجینی تیایە ئەیدات بە شانەکانی لەش. |
| اوكسي كلوريد الكالسيوم | Calciumoxy Chloride = Beleaching Powder = Calcium Oxy Chloride | (بلیچینگ پاودەر، کالسیۆم ئۆکسیدی کلۆراید) تۆزی ڕەنگ لابردن. |
| اوكسي اسيتلين | Oxy acetylene | (ئۆکسی ئەسیتلین)، گڕێکە بۆ لکاندنی کانزاکان بەکاردێت. |
| اوكسيد | Oxide | (ئۆکساید)، ژەنگ، خۆرك، خۆسەرە. |
| اوكسيد الماء | Hydrogen Peroxide | (هایدرۆجین پیرۆکساید) ئۆکسیدی ئاو. |
| اوكسيد النتروز | Nitrous oxide | (نترۆز ئۆکساید)، گازێکی بێ ڕەنگی ژەهرە ئەبێتـە هـۆی پێکـەنین و بـێ هۆشی، لە جەنگا بەکار ئەهێنرێت. |
| اوكسن | auxin | (ئۆکسین)، مادەی گەورە بوون کە لە ڕووەکدا پەیدا ئەبێ. |
| اوكسيد حامض | Acidic oxide | (ئەسیدیك ئۆکساید) ئۆکسیدی ترشەڵۆك. |
| اوكسيدي قاعدي | Basic oxide | (بێزیك ئۆکساید)، ئۆکسیدی تفت و تاڵ. |
| اوكسي كلوريد الزنك | Zinc Oxy Chloride | (زینك ئۆکسی کلۆراید) ئاوێتەیەکە بۆ پڕکردنەوەی ددان بەکارئەهێنرێ. |
| اوكسيد الخارصين | Zinc Oxide | (زینك ئۆکساید)، ژەنگی توتیا، زینکی سپی. |
| اوكع | | پەیزەن، یەکێك پێی خواربێت بەلای پەنجە تووتەدا. |
| اوكالبتوس | eucalyptus | (یۆکالبتۆس)، درەختێکی بەرزە "قەلەمتۆز" بۆ ڕازاندنەوە، گوڵو گەڵاکەی بۆ پزیشکی بەکاردێت. |
| اوكتان | Octane | (ئۆکتـان)، مادەیـەکی هایدرۆکاربۆنییـە، هەشـت ئـەتۆم کـاربۆن و هـەژدە ئەتۆم هایدرۆجینی تیایە. شلەیەکی بێ ڕەنگە لە نەوتی سروشتی دا هەیە. |
| اوكريدية | | (ئۆکاردیەم) جۆرە گیایەکە. |
| اوكونيوم | | (ئۆگۆنیۆم)، ئەندامی ڕەگەزیی مێ لە هەندێك قەوزەدا. |
| اوكزالات | Oxalate | (ئۆکزالەیت)، خوێی ئۆکزالەیك ئەسید. |
| اولستيوم | Chick weed | (هولستیۆم، چیك وید) گیایەکی تووکنە لە کۆمەڵەی مێخەك گوڵی جوان ئەگرێت. |
| اول | First = premier | یەکەم، یەکەمین. |
| اول البارحة | Theday before yesterday | پێرێ. |
| اوليت | Limestone | (نوولیت)، بەردی قسڵ. |
| اولي | Primary | یەکەمی، سەرەتایی، یەکەمینی. |
| اولينين | Olein | (ئۆلینین) ڕۆنی زەیتوون. |
| اوليومارغارين | Oleomargarine | (ئولیۆمارگارین) کەرەی دەستکرد، ڕۆنی ڕووەك. |
| اوليارية | Olearia | (ئولیاریا) داروەوەنێکی هەمیشە سەوزە گوڵەکەی سپی و بۆن خۆشە. |

| | | |
|---|---|---|
| اولیفینس | Olefins | (ئۆلیفینس)، ئەو مادانەن کە لە کاربۆن و هایدرۆجین پێکهاتوون، بەڵام هایدرۆجینیان کەم تیایە لە چاو کاربۆنا. |
| اولیجوسین | Oligocene | (ئۆلیجۆسین) بەشی سێهەمە لەسەردەمی کاینۆزۆی، ئەگەڕێتەوە بۆ (٣٥-٤٥) ملیون ساڵ لەمەوبەر. |
| اوم | Ohm | (ئۆم)، یەکەی بەرهەڵستی کارەبا، بریتی‌یە لە بەرهەڵستی کارەبا لە تەلێکی زیودا کە درێژی‌یەکەی یەك مەتر و تیرەکەی یەك ملیمەتر بێت. |
| اومتر | Ohmmeter | (ئەمیتەر) پێوەری ئۆم. |
| اوملیت | Omelet | (ئۆملێت)، هێلکەو ڕۆن. |
| اونان | Onanism | (ئەسپەر) ئاو هاتنەوە لە دەرەوە لە کاتی پەڕین یان جووت گرتن دا، ئاوهێنانەوە لە دەرەوە. |
| اونس | Ounce | (ئۆنس) یەکەی کێشە لە ڕژێمی ئینگیزی دا، ئەکاتە "٢٨/٣٥" گرام. |
| اونین | Bang=Tronk | هەگبە. |
| اونکو- جیبون | Gibbon | (ئۆنگۆ، جیبۆن) |
| اووتایب | Ootipe | (ئووتایپ)، بەشێکە لە بۆری گەرا، تونکڵی گەراکەی تیا دروست ئەبێت لە کرمی جگەر "پەپوولە"دا. |
| اویاری، ایار | Have a great penis | چووك زل - کێر زل. |
| اویس- اوس | Black jackal | (بلاك، باك، چاکاڵ) چەقەڵی پشت ڕەش. |
| ایاي | Aye-aye | جۆرە مەیمونێکە بەقەدەر پشیلەیەك ئەبێت. |
| آیار | May | (مەی) ئەیار، مایس دوای نیسان دێت "٣١" ڕۆژە. |
| ایابانة | | (ئەیاپانە)، ڕووەکێکی پزیشکی قەدبۆشە، لەناوچە گەرمەکاندا ئەڕوێت، گەڵاکانی بۆ دەرمان بەکار ئەهێنرێت. بۆ بەهێزکردنی گەدەو ئارەق کردنەوەو ووریا کردنەوە، وەکو چایی و قاوە لێ‌ئەنرێت. |
| إیاة- هالة | Sun corona | (هالۆ) خەرمانەی ڕۆژ. |
| ایالة | Beginning | سەرەتا. |
| ایثر | Ether | (ئیسەر)، ئاوێتەیەکە لە کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین، بێ ڕەنگە، زوو ئەسووتێ، مادەیەکی توێنەرەوەیە، زوو ئەبێ بە هەڵم، "هەروەها مادەیەکی بێ هۆشکەرە لە نەخۆشخانەکاندا بەکارئەهێنرێ بۆ سڕکردن و بێ هۆشکردن" |
| إیثان | Ethane | (ئیسان)، گازێکە لە دوو ئەتۆم کاربۆن و شەش ئەتۆم هایدرۆجین پێك هاتووە. |
| ایثار- بق دقیقي | Mealy bug | (ئایسبریا) مێرووییەکە لە درەختی بەردار ئەدات. |
| إیثانول | Ethanol | (ئیسانۆل)، ئەسیل الکول، ئاوێتەیەکە لە کاربۆن و ئۆکسجین و هایدرۆجین بێ ڕەنگەو زوو ئەبێ بە هەڵم، توێنەرەوەیە. بۆ دروستکردنی مەی و دەرمان و بۆیە بەکاردێت. |
| ایثر البترول | Petroleum ether | (لیگۆرین) ئیسەری نەوتی سروشتی. |
| ایدع | Logwood=Campeachy | بەقەم، خوێنی دوو براکە، درەختی ئاژدیها، جۆرە درەختێکە تەختەکەی ڕەنگی پێ ئەکرێت. |
| ایدولوجیا | Idiology | (ئایدیۆلۆجیا)، هونەری گەڕان بە شوێن ئەندێشەو بیردا، بیروڕا. |
| ایدیا | idia | (ئیدیا) جۆرە مێروویەکە لە کۆمەڵەی مێش - مێش کوللە - مێشێکە زیان بە کوللە ئەگەیەنێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ایر-عیر | Penis | چووك، كێر، تڕك كێرەووڵ |
| ایراد | Income = revenue | دەرامەت. داهات. |
| ایراق- توریق | Foliation | (فۆلێشن) گەڵاكردن. |
| ایرجستیرول | Ergosterol | (ئێرجستیرۆڵ) مادەیەكە لە پێستا بە تیشكی ڕۆژ ئەبێ بە ڤیتامین (D ، دی). |
| ایرنتس- زهرة الهواء | Aerflower | (ئێرفلەوەر) گیایەكی تەمەن درێژە گوڵی زۆر جوان ئەگرێت. |
| ایروبیوسکوب | Aerobioscope | ئێرۆبیۆسكۆپ ئامڕازێكە بۆشی كردنەوەی هەواو ناسینی ئەو میكرۆبانەی كە تیایەتی. |
| ایرولوجي | Aerology | (ئێرۆلۆجی) زانستی چینەكانی هەوا. |
| ایرومتر- میزان الهواء | Aerometer | (ئێرۆمەتر) پێوەری خەستیی هەوا. |
| ایروفون | Aerophon | (ئێرۆفۆن) ئامڕازێكە بۆ گەورەكردنی شەپۆلی دەنگ. |
| ایریدیوم | Iridium | (ئیریدیۆم)، توخمێكـە (كانزایەكـە) كێشـی ئەتۆمی‌یەكـەی "١٩٣/١" و ژمارەی ئەتۆمی‌یەكەی "٧٧" ڕەنگەكەی سپی زیوی‌یە ماناكەی لە ووشەی "ئیریس" واتا "پەلكە زێڕینە" وەرگیراوە نیشانەكەی "Ir". |
| ایزومیریة | Isomerism | (ئایزۆمیریزم)، دوو ئاوێتەیان زیاتر كە هەمان پێك هاتنیان هەبێت بەڵام جیاوازبن لە ڕەوشتەكانیان دا. |
| آیزوبرین | Isoprene | (ئایزۆپرین)، ئامادەیەكی هایدرۆكاربۆنی‌یە، لاستیكی لێ دروست ئەكرێت. |
| ایزوتونیك | Isotonic | (ئایزۆتۆنیك)، ئـەو جـۆرە گیراوانەیـە كـە لـە پاڵەپەسـتۆی ئۆزمۆتیكـدا "پاڵەپەستۆی دەڵاندن"دا چونیەكن. |
| ایزوتونات | Isotones | (ئایزۆتۆنس)، ئەو جـۆرە توخمـە هاوتایانـەن كـە ژمـارەی نیۆترۆنـی نـاو ناوكەكانیان چونیەكن. |
| ایسر | The left handside | چەپلەر. |
| ایسر الید | Left handed | چەپلەر، چەپە. |
| ایمن الید | Dextro manual | ڕاستە = كەسێك هەمیشە دەستی ڕاستی بەكاربهێنێت. |
| ایسوتروبي | Iso tropic | (ئایزۆترۆپیك)، چونیەكی لە ڕەوشت (سیفەت)دا وەكوو ئەوەی كە هەموو كانزاكان بە ئاسانی گەرمی ئەگەیەنن. |
| ایشارب | Muffler | سەرپۆش، تەمەزی، دەسماڵ، لەچك. |
| ایصال | Connecting | گەیاندن. |
| ایصر | Hay | گیای ووشك، پووش. |
| ایض | Metabolism | (میتابۆلیزم)، كردارەكانی زیندەوەری، كاریگەری زیندەوەری وەكو "كاریگەری دروست كردنی ئەتەم" وەشی كردنەوەی وەكو "لەناوبردنی ئەتەم"، هەموو ئەو كردارە كیمیایی‌یانەی كە لە شانەی زیندوودا ڕوو ئەدەن. |
| ایضاً | Also | دیسانەوە، هەمدیس، دیسان. |
| ایضاح | Clearing up | ڕوون كردنەوە، واڵا كردنەوە. |
| ایطل- خاصرة | Flank | (هایپۆكوندریۆم) كەلەكە، "كەمەرە". |
| ایعاز | Hinting | پێ ڕاگەیاندن. |
| ایفاء | Payment | جێ بەجێ كردنی بەڵێن. |
| ایفاد | To send | ناردن. |
| ایفودیة | | (ئیڤۆدیا) درەختێكی بێشەڵانە بەرەكەی بۆ مەبەستی پزیشكی باشە. |

| | | |
|---|---|---|
| ایقونة- صورة مقدسة | Icon | (ئایکون) وێنەو پەیکەر. |
| ایقاد | Kindling | داگیرساندن، داگیراندن، ئاگرهەڵکردن، هەڵگیرساندن. |
| ایقاظ | Awakening = awaring | وریاکردنەوە، ڕاپەڕاندن، وشیارکردنەوە. |
| ایقاف | Settingup | وەستاندن، ڕاوەستاندن، ڕاگرتن. |
| ایقاف النزیف | To stanch | وەستاندنی خوێن، خوێن وەستاندن. |
| ایکاکیا- ایکاکو | | (کۆکۆپلەم) درەختێکی گەورەی ناوچە گەرمەکانە، گوڵەکەی سپییەو بەرەکەی لە قۆخ ئەچێت سوورو سپییە ئەخورێت، دەنکەکەی ڕۆنی لێ‌دەرئەهێنرێ. |
| ایك | | (وود ئۆف لوفتی تری) بێشەڵان، دارستان چڕ. |
| ایکة | Thicket=jungle | (جەنگڵ) چەم و چوخورد، بێشەڵان. |
| ایك | Branch | لق، پەل، لقی دار. |
| ایکي دنیا= اکیدنیا - بشملة | Loquat | (بیلاسیەر) "یەنگی دنیا"، درەختێکی بەردارە، بەرەکەی خۆشە. |
| ایکون | | (ئیکۆن) ئیسفەنجی ئاوێتە. |
| ایکفیریا | | (ئیکفیریا)، ڕووەکێکی ئاودارە. |
| ایکونوسکوب | Iconoscope | (ئ ێنۆسکۆپ)، کامێرای تەلەفیزیۆنی. |
| ایکل- بل- قثاء الهند | | (مارمیلرس) درەختێکە لە کۆمەڵەی نارنج، بەرەکەی بە قەدەر پرتەقاڵێکە. |
| ایل | Deer | (دیەر) شقن، تەوور، شوول، کەوزەن، فیلەگێژە، ئافوور، هەفووری، گیاندارێکی سمدارە شاخی نێرەکەی لقی لێ ئەبێتەوە، بەڵام مێیەکەی بێ شاخە، ئاسك. |
| ایلاج | Pushing In | پیاکردن، خستنە ناوەوە، تێ‌خستن. |
| ایل المسك | Musk deer | (مەسك دیەر)، جۆرە ئاسکێکە بۆنی مسك لە ناو سکی دەرئەهێنرێت، "ئاسکی مسك". |
| ایل احمر | Red deer | مەڕە سوورە. |
| ایلول | September | (سەپتەمبەر)، ئەیلول، سەرماوەز، مانگی نۆهەمە ئە نە "٣٠" ڕۆژ، گەڵا ڕێزان. |
| ایلنطس= شجرة السماء- شجرة الله | Tree of heaven | (تری ئۆف هێڤن) درەختێکە خێرا ئەڕوێت نزیکەی "٢٠" مەتر بەرزئەبێتەوە بۆ ڕ'زاندنەوەی باخچەکان ئەڕوێنرێت، گەڵاکەی پانە بۆنی گوڵەکەی بۆگەنە. |
| ایلند= مارية | Oryx | (ئیلاند، ئۆریکس) مانگا کێوی. |
| ایلکس | Ilex | (ئیڵکس)، جۆرە ڕووەکێکە گەڵاکەی سافە بەڵام قەراغەکانی دڕکاوییە، گوڵێکی مەیلەو سپی ئەگرێت بەرەکەی خڕو سوورە تەختەکەی بە نرخە. |
| ایمن- ایمن الید | Right handside = dextro manual | ڕاستە - ڕاستلەر - ئەو کەسەی کە هەر دەستی ڕاستی بەکاربهێنێت. |
| ایناع | Riping | پێ گەیشتن، گەیین، پێ‌گەیشتنی میوە. |
| اینشتینیوم | Enlsteinium | (ئاینشتاینیۆم)، توخمێکی کانزایەکە، ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٩٩)و کێشی ئەتۆمییەکەی (٢٥٤)، توخمێکی دەستکردە لە سروشت دا نییە نیشانەکەی (ES). |
| اینولین | | (ئینۆلین) مادەیەکی کلوکۆزیدە لە خانەی هەندێك ڕووەکدا هەیە. |
| ایوان | Large public room | هەیوان، هۆڵێکی گەورە. |
| ایوان عالي | | چوارتا تاق. |
| ایودید | Iodide | (یۆدید)، خوێی هایدرۆیۆدیك ئەسید. |
| ایون | Ion | (ئایۆن)، ئەتۆمێك یان کۆمەڵە ئەتۆمێکی بارگەکراو بە کارەبا. |

| | | |
|---|---|---|
| ایون موجب | Positive ion | ئایۆنی گەرم، ئایۆنی پۆزێتیڤ. |
| ایون سالب | Negative ion | ئایۆنی سارد، ئایۆنی نێگەتیڤ. |
| ایون معقد | Complex ion | ئایۆنی ئاڵۆزاو. |
| ایۆدین "یود" I | Iodine | یۆد، ئلیۆدین توخمێکی کیمیاگەرییە کێشی ئەتۆمی‌یەکەی "١٢٦/٩" و ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی "٥٣"یە، ناکانزایە ڕەنگی هاڕاوەکەی ڕەشی مەیلەو خۆڵەمێشی‌یە، ماناکەی "ئایودیس" واتا "بنەوشەیی". |
| ایونوسفیر | Ionosphere | (ئایۆنۆسفێر)، چینی سێهەمە لەو توێکڵە هەوایەی کە دەورو پشتی زەوی داوە بۆ ماوەی نزیکەی "٦٠٠" میل درێژ ئەبێتەوە، وە چینێکی ئایۆنی‌یە واتا بە کارەبا بارگە کراوە، ئەم چینە یارمەتی پەیوەندی کردن بە لاسلکی ئەدات. |
| ایوسین | Eocene | (ئایۆسین، ئیۆسین) سوڕی یەکەم لە سەردەمی ژیانی تازە، –ماوەی (٥٠) ملیون ساڵ لەمەوبەر– کە بریتی بووە لە سەدەی گیانداره شیردەرەکان، کۆنترین سەدەکانی سەردەمی سێهەمی جیۆلۆجی. |
| ایون مشترك | Partner ship ion | ئایۆنی هاوبەش، ئەو ئایونەیە کە لە ئەنجامی تێکەڵ کردنی گیراوەیەکی ئەلەکترۆلیتی بە هێز و گیراوەیەکی ئەلەکترۆلیتی بێ هێز پەیدا ئەبێت. |
| ایواء | Lodging | حەواندنەوە، داڵدەدان. |
| ایهان- جرجیر- ایهقان | Rocket | (ڕۆکێت) کوورزەڵە. |

| | | |
|---|---|---|
| بئر | Well | بیر، چاڵاو، قوڵییت. |
| بئر البترول- بئر النفط | Well of petrol | بیری نەوت. |
| بئر ارتوازية | Artesian well | (ئەرتیزیان وێل) جۆرە بیرێکە لە دۆڵی بەینی دوو چیادا کە ئاو لە ناو زەوی چیاکاندا هەبێ و لە دۆڵاییەکەدا بیری بۆ هەڵئەکەنن لەبەر ئەوەی سەرچاوەی ئاوی بیرەکە بەرزە لە ئاو هەردوو چیاکەدایە بە تەوژم ئاوەکە لە بیرەکە دێتە دەرەوە لەبەر ئەوە بەلوعەی لەسەردا ئەنێن بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرن، "بیری ئیرتیوازی" بەناوی (ئیرتیوا) لە فەرەنسا ناونراوە بیرێکە قووڵییەکەی "١٠٠-٢٠٠" مەترە. |
| بائر | Fallow land | (ئەنکل تیفیتد) بەیار، زەوی بەیار. |
| بائع | Seller | فرۆشیار. |
| بائع المفرد | Single | تاك فرۆش. |
| بائع الجملة | Whole seller | کۆ فرۆش. |
| بائع الفواكه | Fruit seller | میوە فرۆش. |
| بائع خضروات | Green grocer | بەقاڵ، تەڕە فرۆش، سەوزە فرۆش. |
| بائع التبغ | Tobacco seller | توتنچی. |
| بائع متجول- بائع دوار | Hawker | دەستگێڕ، وردەفرۆش، چەرچی. |
| بائع الزهور | Flowers seller | گوڵ فرۆش. |
| بابيت | Babbitt | (بابیت)، جۆرە دارشتەیەکی کانزاییە. لە مس و ئەنتیمۆن و تەنەکە پێك هاتووە دژی لێك خشاندن بەکاردێت. |
| باب | Door | دەرگا، دەرگێل، قاپی. |
| باب مصنوع من الأغصان | | چەپەر، بەرمە جێل، دەریەن جەلە. |
| بابونج- اقحوان | Chamomile | (کاکومێل) بەیبون، گەزنە، گوڵەکەی زەرد و سپییە، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکار دێت، گوڵەفەقێ. |
| بابيروس | Rush | زەل، تەرکە. |
| بابيروسة | Babirusa | (بابیرۆسا) بەرازی هیندی. |
| باباظ | Papaya | (پاپایا، پاپاو)، درەختێکی بچووکە لە باکووری ئەمریکا ئەروێت بەرەکەی لە شەمامە ئەچێت چوار گۆشەیە سەوز یان زەردە، دەنکی ڕەشی تیایە، یارمەتی هەرس کردن ئەدات، وا خۆشە کە شەکرو ئاوی لیمۆی ترشی پێوە بکرێت. |
| بابلوما | | (بابلۆما) سەرەتانی لێوو زمان. |
| بابوج | Heelless slipper | پاپووچ، جۆرێکە لە پێڵاوی ژنانە. |
| بابون | Baboon | (بابوون) بابوون، جۆرێکە لە مەیمون کەتە و کلك کورتە. |
| بابيزيا المواشي | Babesia | مشەخۆرێکە بەچاو نابینرێ لە خوێنی ئاژەڵدا ئەژی، وە توشی نەخۆشی ئەکات. |
| بابونج الطيور- شرونة | Common groundses | (کۆمۆن گراوندسیل) گیایەکی دەشتەکی و پزیشکییە گوڵی سپی یا زەرد یان ئاڵتونی هەیە. |
| بابونق- تفاح الارض | Wild chamomile | (وایلد جامومیل) "سێوی بن ئەرز". |
| بابيو | | (پاپیو)، جۆرە مەیموونێکە بەسەریا لە سەگ ئەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| باباو | Papaw | (پاپاو، ئەسیمینا) جۆرە دارو دەوەنێکە بەرکەی لە تری ئەچێت و لاکێشەییە، شەرابێکی خۆش لە بەرەکەی ئەگیرێت. |
| باثولوجیا | Pathology | (پاسۆلۆجی)، بەشێکە لە زانستی پزیشکی باسی دەست نیشان کردنی نەخۆشی و هۆیەکانی و نیشانەکانی ئەکات. |
| باثولوجي | Pathologist | (پاسۆلۆجیست)، پزیشکی نەخۆشییەکان. |
| کراع- باجە | Trotter | سەروپێ، پاچە، سەروپێچکە. |
| باحة | Open place=Yard | حەوش، حەوشە. |
| باحوراء- باحور | | چلەی هاوین، تینی گەرمی لە مانگی تەممووزدا، حەوت ڕۆژ، گوایە هەر ڕۆژێکی باری کەش وەك یەکێك لە مانگەکانی زستان یان پاییز ئەبێت. |
| باحث | Resear cher | (ریسێرچەر) کنەکار، لێکۆڵەرەوە، توژەر. |
| باخرة | Steam ship | پاپۆر. |
| بادیة، صحراء، قفر | Desert | (دیزەرت) بیابان، ئاران، چۆڵەوانی، چۆڵ. |
| بادیات الزهر | Phaenerogame | ڕووەکە گوڵدارەکان، ئەو ڕووەکانەن کە ڕەگ و قەدو گەڵا و گوڵیان هەیە وەکو زۆربەی ڕووەکەکان، هەڵووژەو گوڵەباخ. ئەو ڕووەکانەی کە گوڵی ئاشکرایان هەیە. |
| بادرة | Seedling | چەکەرە، چەکەرە کردن، چووز، بنتاو، زیل دەست پێشکەری. |
| بادلو | | (بادلۆ)، مادەیەکە تێکەڵ ئەکرێت لەگەڵ چیمەنتۆ لە نێوانی بناغەی دیواردا. |
| بادرة | Spear- head | سەری تیر. |
| بادزهر- باکزهر | Bezoar | (بیزوار) مادەیەکی ڕەقی خڕ یان هێلکەییە لە لەشی گیانداردا پەیدا ئەبێت، جاران وا ئەزانرا کە ئەم مادەیە دژی ژەهرە، (بازەهر) یان ناوی بەردێکە لە گەدەو ڕیخۆڵەی هەندێ گیانداری کاوێژکەردا پەیدا ئەبێ. |
| بادستر- قندس | Beaver | (بیڤەر) سەگلاو. گیاندارێکی شیردەری ئاوییە. |
| بادن | Corpulent | قەڵەو، تێکسمراو. |
| بادروج- حبق | Common bast | (کۆمۆن باسیل) ڕەیحانە، ڕێحانە. |
| بادزهر الخیل | Horse bezoar | بەردێکە لە گەدەی وڵاخدا پەیدا ئەبێ، گوایا دژی ژەهرە. |
| بادن | | ئەو مێرووەی کە لەسەر گۆشت ئەژی. |
| بادنجان | | (سنیدیۆم) گیایەکی پزیشکیی شاخاوییە گوڵێکی سپی هەیە. |
| باذنجان | Eggplant = aulergine | (ئێگ پلانت، بیرینجیناس)، بایەنجان، باینجان، باینجانی ڕەش، بامجان، گونی ڕووەك. |
| بازق | | باسووق، دۆشاوی ترێ کە توندکرابێتەوە بەگەرم کردن و پارچەپارچە کرا بێت و ئاردی تێ کرابێت. |
| باذر، زارع | Sower | (سۆوەر) تۆوکەر. |
| باذروخ | Common basil | ڕیحانە، ئەسپەرەم. |
| باذرة | Sower machine | تۆوچێن، مەکینەی تۆوکردن، تۆو وەشاندن بە زەویدا بۆ کشتوکاڵ. |
| بئر | Well | (ویل) بیر. |
| بئر ارتوازیة | Arlesian well | (ئەرتیزیان)، بیری ئیرتوازی جۆرە بیرێکە کە هەڵئەکەنرێت ئاوەکەی لێ هەڵ ئەقوڵێت. |
| بارود | Gun powder | (گەن پاودەر) بارووت، تێکەڵاوی خوێی نیترات و گۆگرد و خەڵوز بۆ تەقاندنی گوللە. |

| | | |
|---|---|---|
| بارز | Projecting = apparent | دیار، دەرکەوتوو. |
| بارح | Hot wind | بایەکی گەرمە. |
| بارحة | Yesterday | دوێنێ. |
| بارودة | Shot-gun | تفەنگی ڕاو، تفەنگی ساچمە، گوللە و ساچمەی پێ ئەتەقێنرێ بە هۆی بارووتەوە. |
| بارع | Skil ful | شارەزا، دەست سوك، کارامە. |
| بارجة | Battle ship | (باتل شیپ) پاپۆڕی جەنگی، کەشتی جەنگی. |
| باریتا | Bareta | (باریتا)، باریۆم ئۆکساید، هاڕراوەیەکی سپی‌یە بۆ دروست کردنی بۆیەی سپی و کاغەز بەکار دێت. |
| بارود اسود | Black gun powder | باڕووتی ڕەش. |
| بارود عدیم الدخان | Smakeless powder | باڕووتی بێ دووکەڵ، لە تێکەڵ کردنی نترۆسلیلۆزو ئەلکهوول و ئیسەر دروست ئەکرێت. |
| بارافینات | Paraffins | (پارافینس) پارافینەکان، زنجیرە ئاوێتەیەکی کیمیایین کە لە کاربۆن و هایدرۆجین پێك هاتوون تێرن بە هایدرۆجین وەکو میسان. |
| باری- باریة- بوریة | Strawmat | (سترومات) حەسیر. |
| باراتیفوئید | Paratyphoid | (پاراتیفوئید) ڕەشەگرانەتێ، جۆرێکە لە گرانەتا. |
| بارومتر | Baro meter | (بارۆمەتر)، بانما، پەستان پێو، پێوەری پاڵەپەستۆی هەوا، دەزگایەکە بۆ پێوانی پاڵە پەستۆی هەواو دۆزینەوەی بەرزی. |
| باراثایروید- جنبدرقي | Parathyroid | (پاراثایرۆید)، لوویەکە لە نزیك قوڕگەوە. |
| باراثیون | Parathion | (پاراثیۆن) دەرمانێکە بۆ قەلاچۆ کردنی مێروو. |
| باروسمة | Barosma | (باروسما) دەومەنێکی بۆن خۆشی پزیشکی‌یە. |
| باريء | God | خوا. |
| باربیري | Barberry | (باربێری)، دەومەنێکە بۆ ڕازاندنەوە یان پەرژین ئەڕوێنرێ، هەندێ جۆری هەمیشە سەوزە و هەندێکی گەڵاکانی ئەوەرێ، هەندێ جۆری لقەکانی مەیلەو ڕەش یا بنەوشەیی یان سوورە. |
| بارسیك- فرسخ نجمي | Parsec | (پارسیك)، فرسەقی ئەستێرەیی، یەکەی پێوانی دووری ئەستێرەکان، بریتی‌یە لە (١٩/٢) ملیۆن ملیۆن میل. |
| باريوم Ba | Barium | (باریۆم)، توخمێکی کانزایی‌یە کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (١٣٧) و ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٥٦)ە، کانزایەکی سپی زیوی‌یە ماناکەی "باریەس" واتا "قورسی" ئەگرێتەوە، خوێیەکانی بەشدارئەبن لە دروستکردنی شووشە و فیشەکە شێتەدا. |
| باروغراف | Barograph | (بارۆگراف)، بارۆمەتری تۆمارکەر. دەزگایەکە لە خۆیەوە پاڵەپەستۆی هەوا تۆمار ئەکات. |
| بارومتر معدني | Aneroid | (ئەنیرۆید) بارۆمەتری کانزایی. |
| باروسکوب | Baroscope | (باروسکۆب) ئامرازێکە گۆڕانی پاڵەپەستۆی هەواو، کەمبوونی کێشی تەن لە هەوادا نیشان ئەدات. |
| بارومتر جاف | Dry barometer | بارۆمەتری ووشك، بارۆمەتری کانزایی. |
| باروكة | Wig | موچاخ، قژی لەعیە. |

| | | |
|---|---|---|
| بارافين- ثارافين | Parrafin | مادەیەکی چەوری نیمچە ڕەقە لە قەترانی خەڵوز و نەوتی سروشتی دەرئەهێنرێت بۆ خاوکردنەوەی دیواری ڕیخۆڵە، واتا دژی قەبزی، هەروەها بۆ دروست کردنی مۆم بەکاردێت، بێ بۆن و بێ تام و بێ ڕەنگە. |
| باراشوت | Parachute | پەراشووت. |
| باراكودا | | (پاراکودا) جۆرە ماسی‌یەکە. |
| بارد الدم | Cold blooded | (کۆڵد بلۆدید) خوێن سارد، ئەو جۆرە گیاندارەیە کە پلەی گەرمی لەشی ئەگۆڕێت بە گۆڕانی پلەی گەرمی دەرەوە. |
| بارنج- نارجيل- جوز الهند | Coconut | گوێزی هیندی. |
| بارلوس | | ماسی شیلان، جۆرە ماسی‌یەکە لە ئاسیاو ئەفەریقادا ئەژی. |
| بارض- بارضيات | Meristem | چەکەرە، سەرەتایی ئەو ڕووەکەی کە لە زەوییەوە دێتە دەرەوە. |
| باربتيورات | Barbiturate | (باربتیورەیتس)، ناوی کۆمەڵێکە لە ڕووەك، کۆمەڵە دەرمانێکن بۆ خەواندنو سڕکردن بەکار ئەهێنرێن. |
| باز- بازي | Goshawk | |
| هوك | Hawk | (گۆسهۆك) باز، تەرلان، باڵندەیەکی گۆشت خۆرە ڕاوی پێ ئەکرێت، جۆرە، شاباز، ئیلۆ، تەوار. |
| بازلت | Basalt | (بازلت، باساڵت)، مەرمەڕی ڕەش، بەردێکی ڕەقی سووتاوە. ڕادەیەکی زۆر لە ئاسن و مەگنیسیۆمی تیایە. |
| بازر- حابب | Seed eater | دانخۆر، تۆو خۆر. |
| باز مقلنس | Hooded-hawk | بازی کڵاودار. |
| بازلاء- بازليا | Peas | (پیس) پۆڵکە، ڕووەکێکە بەرەکەی سەوزە لە ئۆك ئەچێت ئەکرێت بە چێشت. |
| بازلاء البقر | French beans | لۆبیا. |
| باز ملكي | King hawk | شایەن، شاباز. |
| بازيلة | Basella | (باسیلی) گیایەکی دەشتەکی و پزیشکی‌یە لە کۆمەڵەی پاقلە، گەڵاکەی ئەکرێت بە چێشت - سلێنانەی ئەمریکی. |
| بازبند - دملج | Armlet | بازوبەند، بازی بەند ، بازنی قۆڵ. |
| بازيد | Mush room | (بازیدیەم)، جۆرێکە لە قارچك. |
| بازيليسق- بازيليسيك | Basilisk | (باسیلیسك، بازیلیسك)، جۆرە مارمێلکەیەکە سەرو پشتی پێستێکی بەرزی پێوەیە لە ئەمریکا ئەژی. |
| بازنجي | Basenje | سەگێکی ڕاوی ئەفریقی بچووکە بە دەگمەن ئەوەڕێت. |
| بأس | Power | هێز، زەبر. |
| باسقة | Stratus | (ستراتەس) هەوری سپی و ڕوون. |
| باسق | High | بەرز، بڵند. |
| باسور "بواسير" | Piles | (پایلس) پیسۆر، مایەسیری، چەند گرێیەکە لە ماسولکەی کۆم دا پەیدا ئەبێ بەهۆی کشانی بۆڕی خوێنەوە وە هەندێك جار خوێنی لێ دێت. |
| باسورك- باسورق | | تەنگیز، چەقالە، شفشك، بایەف، شەوا شینك. |
| باستمرار | Continually | پەیتا پەیتا، بە بەردەوامی، پەی دەرپەی، پەستا پەستا، بێ ووچان. |
| باسبورت - جواز السفر | Passport | (پاسپۆرت)، گوزەر نامە، پەساپۆرت. |

| | | |
|---|---|---|
| باسية- شجرة الزبدة | | (باسيا) درەختێكە شیراوێكی لـێ دەرئەهێنرێت بـۆ مەبەستی پزیشـكی تۆوەكەیشی ئەكرێت بە جۆرێك لە كەرە. |
| باسطرمة | Jerked beef | باسترمە، باستورمە. |
| باسيلوس | Bacillus | (باسیلۆس)، جۆرە باكتریایەكە شێوەكەی لە چیلكەو گۆچان ئەچێت. |
| باشكير | Towel | خاولی. |
| باشق | Sparrow hawk | (سپارۆهۆك) واشە، بچووكترین باڵندەی گۆشت خۆرە، (باشووكە)، جۆرێكە لە هەڵۆ، بازۆری، تۆرمتە، تۆرنتە. |
| باص | Bus | پاس، جۆرێكی گەورەیە لە ئۆتۆمبێل. |
| باصرة | Eye | بینایی، چاو. |
| باطس- عليق | Black berry | (بلاك بێری) تووترك. |
| باطية | Tankard= beaker | جام، پەرداغ. |
| باطن اليد | Inside the hand | بەری دەست، لەپی دەست، شەپ. |
| باطن الركبة | Inside the knee | رەمانە، ژێر ئەژنۆ، پشت ئەژنۆ، قولایی ئەژنۆ. |
| باطن الارض | Bowels of the earth | ناوەوەی زەوی، ناخی زەوی. |
| باطني | Interior | (ئینتیریال) دەرونی. |
| باطون | Concrete | (بیتون) تێكەڵاوی چیمەنتۆو لم و ئاو بۆ دروست كردنی خانوو بەكاردێت. |
| باع | arm | باسك، باڵ، پێوەرێكە بۆ درێژی (١٦٢سم). |
| باعوط | Tick | ئەسپێی بەر، چنگنە، چنگە. |
| باغة | Celluloid | (سیلولۆید) باغە، هەندێك شتومەكی لێ دروست ئەكرێت. |
| باغية | Prostitute | قەحبە، سۆزانی. |
| بافية، كامة | | (بافیا) درەختێكـی ناوچـە گەرمەكانـە تەختەكـەی قـورس و بـۆن خۆشـە رەنگێكی سووری لێ دەرئەهێنرێت. |
| باقة | Bunch | باخە، چەپك، تاخە، گورزە، دەسك، چكمە ساو. |
| باقورة | Cattle Shade | (كاتل شێد) تەویلە. |
| باقي | Remainder | پاشماوە، دوا ماوە، ماوەتەوە. |
| باقلاء برية | Wild broad bean | شۆقل، شولك، كشۆل. |
| باقلاء | Broad bean | (برۆدبین) پاقلە، كاكرۆس. |
| باقل، سعران، نشمة | Grewia | (ئەنابان) دەوەنێكە بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| باكليت | Bakelite | (باكیلایت)، مادەیەكی رێسینی دەستكردە بۆ دروست كردنی پلاستیك. |
| باكورة- بكيرة | Early | (ئیرلی) سەرگوڵ، نۆبەرە، نوخشە، نەورەس. |
| باكورة الحليب | First milk | خیج. |
| باكة | Paca | (پاكا)، گیاندارێكی ئەمریكی قرتێنەرە. |
| باكاس | | (پاكـاس) گیـاندارێكی شـیردەری قرتێنـەرە لـەش و سـەروچاوی گەورەیـە و گوێچكەی بچووك و پەل كورتە، نینۆكی تیژە لە ژێر زەویدا ئەژی و گیا خۆرە. |
| باكور | | بارانی پەڵە. |
| باكتريا - بكتريا | Bacteria | زیندەوەرێكی رووەكیە لەشی لەیەك ئەتەم پێك هاتووە، بەچاو نابینرێت، (باكتریا). |
| بالة | Bale | فەردە، بەستەك، تا. |

| | | |
|---|---|---|
| بالي | Pragged | کۆن، شڕ، پواو، فەتار. |
| بالنسبة | | بەپێی "ڕێژەی"، بەگوێرەی، لە چاو. |
| بالميتين | Palmitin | ڕۆنێکە بەزۆری لە خورمادا هەیە، خوێی پاڵمیتیك ئەسید. |
| بالطو | Over coat | پاڵتۆ، قاپووت. |
| بالوعة | Sink | ئاوەڕۆ، بۆری ئاو، بەلووعە، گونج، ئاوەڕۆکە. |
| بالغ- بالغ في السن | Adult | (ئەدەڵت) بلووق بوون، پێ گەیشتو، هەرزەکار، قراسە، پانگ، ڕەسیدە. |
| بال- بالين- بالينا | whale bone | (وێڵ بۆن) (بالینا) جۆرێکە لە نەهەنگ پشتی پەڕەکەی پێوە نییە، ددانی نییە، لە جیاتی ددان مادەیەکی ڕەقی هەیە درێژییەکەی نزیکەی (٢٥) مەتر ئەبێت. |
| بالون | Balloon | (باڵۆون) باڵۆن. |
| بالالايكة | Balalaika | (بالالایکە)، ئامرازێکی مۆسیقایە لە کەمانچە ئەچێت. |
| باليوجين | Paleogene | پاڵیۆجین، سەرەتای بەشی سێهەمی سەردەمە جیۆلۆجییەکان. |
| باليوسين | Paleocene | سەردەمی تازەی پێشتر سەردەمێکی جیولۆجییە. |
| باليونتولوجيا | Paleontologic | (پالیۆنتۆلۆجیا)، زانستێکە باسی شێوەی ژیان ئەکات لە سەدە جیۆلۆجییە کۆنەکاندا لە ڕێگەی پاشماوەی گیاندارو ڕووەکە بوو بەردەکاندا. |
| بالدرين | | (پالدورایین) دەرمانێکی دەستکردە دژی لەرزوتا بەکاردێت. |
| باليوزوي | Paleozoic | (پالیۆزۆی)، سەردەمێکی جیۆلۆجی کۆنە. |
| باميا، بامية | Okra | (ئۆکرا) بامێ. |
| بامبو | Bamboo | (بامبۆ)، تەرکەز، قامیشی هیندی، نەیژە، لەوان، حەیزەران، لەڤەن. |
| بان، يسر، يسار | Ben oil tree | (بان) درەختێکە ڕۆنێکی بۆنخۆشی لێدەردەهێنرێت. |
| | Horse radish | (هۆرس رادیش تری) درەختێکە زۆر بەرزە گەڵاکانی درێژەو ئاوێتەیە گوڵی سپی ئەگرێت، جۆرە ڕۆنێکی لێ دەرئەهێنرێ. |
| بانجو | Banjo | ئامرازێکی مۆسیقایە. |
| بانطلون | Trowsers | پانتۆڵ. |
| باندا | Panda | (پاندا)، باندا گیاندارێکە لە ورچ ئەچێ. |
| بانيان | Banian | (بانیان)، هەنجیری بەنغالی، جۆرە درەختێکی هەنجیرە لە ئاسیا ئەڕوێ لقەکانی ڕەگ دەرئەکات شیلەو توێکڵەکەی بۆ دەرمان بەکارئەهێنرێ، لە دورگەکانی هیندی ڕۆژهەڵات ئەڕوێ. |
| بانتوغراف - منساخ | Pantograph | (پانتۆگراف)، ڕەنووس کەر، ئامرازێکە بۆ ڕەنووس کردنی نەخشەو وێنەی نیشاندەر بە گەورەیی یان بە بچووکی. |
| بانيو | Bathing tub | (باثینگ تەب) بانیو، حەوزێکی لاکێشی گەورەی قووڵە ئاوی تێ ئەکرێ لە گەرماودا بۆ خۆشتن لە فەخفووری دروست کراوە. |
| بانسي- بانسية | Pansy | (پانسێ)، هەرجایی، گوڵێکی سێ پەلکی ڕەنگینە. |
| باه | Semen = sperm | مادەی نێر. |
| باهت | Fade | کاڵ، ڕەنگی کاڵ. |
| باهر | Brilliant | دڵ ڕفێن، قەشەنگ. |
| باهرة- صبارة | Agave | (ئەگیڤ) ڕووەکێکە لە زەمەق ئەچێت ئاوەکەی ژەهرە، سوبێر. |
| باهظ | Excessive | گران، قورس. |

| | | |
|---|---|---|
| باولونيا | | (پاولۆنیا) درەختێکی جوانە گوڵەکەی شینە. |
| باوباب | Baobab | (باوباب)، درەختێکە لە ناوچە گەرمەکانی ئەفریقا ئەڕوێ کەتەیە بە قەوارە هەر چەندە زۆر بەرز نابێتەوە، جاری وا هەیە تیرەی قەدەکەی ئەگاتە (٩) مەتر، توێکڵەکەی ریشاڵی تیایە پەت و قوماشی لێ دروست ئەکرێت، کاکڵەکەی ئەخورێت، تەختەکەی تەڕو نەرمە، قەدەکەی هەڵ ئەکۆڵرێت و ئەکرێتە قۆختە بۆ ئەوەی مرۆڤی تیا بژی. |
| باوندال | Poundal | (پاوندال)، یەکەی هێز. |
| باوند | Pound | پاوەن، پاوەند، رەتڵی ئینگلیزی، یەکەی پێوانەی کێش-(١٦)ئونس -٤٥٣/٦گرام -(١٢) ئیزرەم. |
| بايخ | With out taste | بێ تام. |
| بايريت | Pyrite | (پایریت)، کەرەسەیەکی خاوە بۆ ئاسن و گۆگرد، مەعدەنێکی زەردە. |
| بايسون | Bison | (بیسون)، گای ئەمریکی. |
| بايثون | Python | (پایثون)، جۆرە مارێکی گەورەیە. |
| بايراكنثا | Pyracantha | (پایراکنثا)، دەوەنێکی بچکۆلەی هەمیشە سەوزە، نزیکەی "٣" مەتر بەرز ئەبێتەوە، لقەکانی دڕکاوییە، بەرەکەی لە ترێ ئەچێت، بە شێوە هێشو بە رەنگی سوور هەموو لقەکانی داگیر ئەکات و گوڵەکەی سپییە. |
| باينت | Pint | (پاینت)، یەکەی پێوانەی قەوارەی شلە بریتییە لە "٥٦٨"سم$^{2}$ -٥٧٪ی لیترێک. |
| بايوغرافي | Biography | (بایۆگرافی)، بەسەرهات نامە، نووسینی مێژووی ژیانی یەکێك. |
| بايوميتر | Biometry | (بایۆمیتەر) پێوەری ژیان. |
| بايولوجي - علوم الحياة | Biology | (بایۆلۆجی)، زانستی زیندەوەری، زانستی گیاندارو ڕووەك، زانستی ژیان. |
| بايرينويد | Pyrenaid | (پایرینۆید)، تەنێکی خڕە، لە لەشی ڕووەکی کلامیدۆمۆناسدا، فرمانەکەی کۆکردنەوەی خواردەمەنییە، پەیوەندی بە نشاستەوە هەیە. |
| ببايا- بباظ | Papaya | (پاپایا) جۆرە درەختێکی ناوچە گەرمەکانە بەرەکەی لە هەرمێ ئەچێت. |
| ببتون | Peptone | (پیپتۆن) مادەیەکی نترۆجینییە لە هەرسی پرۆتین پەیدا ئەبێ. |
| ببر | Tiger | (تایگەر) بەور، جۆرە پڵنگێکە لە هیندستان زێرسك و قەبرغەکانی سپیو لەشی خەت خەتاوی ڕەشە، جۆرە پڵنگێکە پێستەکەی خەت خەتە واتا میلدارە. |
| ببر امريكي | Ocelot | (ئۆسیلۆت) بەوری ئەمریکی. |
| ببسين | Pepsin | (پیپسین)، مادەیەکی لیکاوی ترشەڵۆکە لە گەدەدا ئەڕژێتە سەر خواردەمەنی پرۆتینییەوەو ئەیگۆڕێ بۆ شێوەیەکی ئاسانتر لە پێك هاتنا بۆ ئاسان کردنی کرداری هەرس. |
| ببغاء | Parrot | (پارۆت) تووتی، باڵندەیەکە ئەگەر گوێی لە قسە بێت دووبارەی ئەکاتەوە. |
| ببرية- عين الطاووس | Tiger flower | (تایگەر فلەوەر) گوڵە بەور، ڕووەکێکی سەلك دارە گوڵی هەمە جۆر ئەگرێت. |
| ببغاء اسود | Black parrot | تووتی ڕەش، سارۆ، شارك. |
| ببو | Papaw | (پاپاو) درەختێکە گوڵێکی ئەرخەوانیی هەیە، بەرێکی زەردی هەیە، ئەخورێ لە ناوچە گەرمەکانی ئەمریکا ئەڕوێت. |
| بترول | Petrol | (پیترۆل) گازۆلین، بریتییە لە تێکەڵاوێکی ئاڵۆز لە هایدرۆکاربۆنەکان و سووتەمەنیی تر. |
| بترولوجي | Petrology | (پیترۆلۆجی)، زانستی خوێندنی بنەڕەت و پێکهاتنی بەردەکان. |

| | | |
|---|---|---|
| بترليوم | Petrolium | (پەترۆلیۆم) ڕۆنی بەرد، نەوتی سروشتی، ڕۆنێکی کانزاییە مەیلەو ڕەشە ئەسووتێ لە ناخی زەوییەوە دەرئەهێنرێ بۆ ڕووناک کردنەوەو گەرم کردنەوەو چەورکردنی مەکینە بەکاردێ. گازۆلین و نەوتی سپی و بەنزین و قیری لێ دەرئەهێنرێ. |
| بتر | Cutting off | بڕین، قرتاندن، بڕینەوەی ئەندام. |
| بتر، عديمات الذنب | Tailess = anura | (ئەنورەس) بێ کلکەکان، وەکوو بۆق. |
| بتروكيمياوي | Petro chemical | (پیترۆکیمیایی) کیمیاگەریی نەوت، ئەو پیشەسازییە کیمیاییانەی کە پەیوەندی هەیە بە نەوتی سروشتییەوە. |
| بتروسورس | Pterosaur | (پیترۆسۆرس) گیاندارێکی خشۆکی باڵداری قڕ تێکەوتووە. |
| بتشبلند | Pitch blende | (پتشبلەند) ئەو کەرەسەیەیە کە ڕادەیەکی زۆر یۆرانیۆمی تیایە، بریتییە لە ئۆکسیدی یۆرانیۆم، ڕەنگی ڕەشە بەزۆری لە کەنەداو چیکۆسلۆفاکیاو کۆنغۆ هەیە، کانزای ڕادیۆمی لێ دەرئەهێنرێت ڕەوشتی تیشک دانەوەیەکی زۆری هەیە. |
| بتع | Hydromel | (هایدرۆمیل) شەرابی هەنگوین. |
| بتلة- قعالة | Petal | (پیتاڵ)، پەڕەی گوڵ. |
| بتول | Vergin | کچ، کیژ، کەنیشک، گەورە کچ، ئەو کچەی کەوازی لە شووکردن هێنابێ. |
| بتولين | Betolene | (بەتولین) ڕۆنێکی عەترە لە درەختی (بێرچ) دەرئەهێنرێ بۆ چارەکردنی هەندێ نەخۆشی پێست. |
| بتولا- سندر | Betula=Birches | (بیرچ) تیروو درەختێکی جوانە تەختەکەی بە نرخە و کاغەزی لێ دروست ئەکرێ و مادەی دەباخی لێ دەرئەهێنرێت، گەڵاکەی ددانداره گوڵەکەی وردە قەدەکەی سپییە گەڵاکەی وەکو چای بەکاردێت و ئاوەکەی شیرینەو ئەکرێت بە شەراب. |
| بتونيا- بطونيا | Betony | (بیتۆنیا) (پاتۆنیا) گوڵە قەوان، ساڵێك یا دوو ساڵ ئەژی، گەڵاکانی سادەو هێلکەییو بەرامبەریەکن گوڵەکانی لە زۆرنایەکی دەم پان ئەچێت، بەرەنگی سپیو سوور و شین و بنەوشەیی و پەمبەیی. |
| بتية | Bath | بەرمیلێکی گەورەی تەختەیە، بەرمیل، حەوزی خۆشتن، بانیۆ. |
| بتيرانودون | Pteranodon | (پتیرانۆدۆن) گیاندارێکی خشۆکی باڵداری کەتەی قرتێکەوتووە. |
| بتيرة- اتان | She ass | (شی ئاس) ماکەر. |
| بثرة | Pimple | (پیمپڵ) تامێزك، زیپکە، قنچکە، تامێسك، پیزوکە، بەرزك، بەرزۆك، کرمژنە، خشرۆك. |
| بثرة شرقية | Lich mania-Tropica | کانی خورما. |
| بثرة العين | Pustule of eye | باپشکێو، قنچکەی چاو، سیچکە سڵاوە، ئەگەگە، بوکە، قنچکەسڵاوە. |
| بث - إرسال | Spreading = transmitting | ناردن، بڵاوکردنەوە. |
| بثينة | Hang | جۆرێکە لە بەنگ، گیایەکی دەشتەکی ژەهرینە. |
| بج | Chick = squab | جووجەڵەی باڵندە. |
| بج- قط نمر | Tiger cat | (تایگەر کات، سیرڤاڵ) پشیلە پڵنگ، پشیلە کێوییەکی بەڵەکە واتا پنکە پنکەیە. |
| بجرة، فتاق، فتق السرة | Hernia=Ruptune | قۆڕی، قۆڕیی ناوك. |

| | | |
|---|---|---|
| بجع= بجعة- حوصل- سقاء= جمل الماء- ابو شلبة - ابو جراب= ابو قربة | Pelican | (پێلیکان)، قوو، سەقاقوش، باڵندەیەکی ئاوی گەورەیە دەنووکی پان و درێژە، سیکڵدانۆچکەیەکی گەورەی هەیە لە ژێر دەنووکیدا بۆ کۆکردنەوەی ماسی. |
| بجع اشعث | Un kempt= pelican | جۆرە سەقاقوشێکە پەڕەکەی سەری گژە. |
| بجل- دروين | Dourine = Try Danosoma | (ترپیانۆسۆم) جۆرە نەخۆشییەکی درمی پیسە لە فەرەنگی ئەچێت برین لە لێوی نەخۆشەکە پەیدا ئەبێت، نەخۆشییەکە تووشی وڵاخ ئەبێت بەهۆی کرمێکی باریکەوە. |
| بجماتيت | Pegmatite | (بیگماتیت)، بەردێکی ئاگرینە کریستاڵی کوارتز و فیڵدسپار و گرانیت و هەندێك کانزای تیایە. |
| بجمة- اثل | Tamarisk | (تاماریسك) دارگەز، دەوەنێکە لە سنەوبەر دەچێت. |
| بجم | Foolish | گێل، حۆل، گێژ. |
| بجونيا | Begonia | بیجۆنیا ڕووەکێکی ناوچەگەرمەکانە. |
| بحار | Sailor | دەریاوان. |
| بحتران | | (سیمین کونتوا) گیایەکی پزیشکییە. |
| بحت | Pure | پەتی، خالیصە. |
| بحة الصوت | To be hoarse | دەنگ گر بوون، دەنگ گڕی. |
| بحث | Research | لێکۆڵینەوە. |
| بحر | Sea | دەریا. |
| بحرية | Navy | (نێڤی) هێزی دەریا، لەشکری دەریا. |
| بحر الشمال | | دەریای باکوور. |
| بحر المتوسط | Media terraneansea | دەریای ناوەڕاست. |
| بحران | Delirium | وڕێنە، وڕێنەی نەخۆش. |
| بحيرة | Lake | (لێك) گۆم، گۆماو، دەریاچە، بەرەم، بارەو. |
| بخار | Vapour | (ستیم) (ڤاپور) هەڵم، هەڵاو، هاڵاو. |
| بخاق | Wolf (male) | (وولف میڵ) گورگی نێر. |
| بختري- غرنوقي | Stork bill | دەنووکی لەقلەق، دەرزی لووکە، ڕووەکێکە گوڵێکی پەمەیی هەیە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| بخت= بختي | Bacterian camel | (بۆگدی) ووشتری دوو دووگی خۆراسانی. |
| بختية- شجرة البخت- شجرة الرهبان | Glory tree | (گلۆری تری) درەختی بخت، دارو دەوەنێکە هیندییەکان تەختەکەی ئەسووتێنن لە کاتی نوێژکردندا. |
| بخرج | Wildcow (child) | بێچووی مانگا کێوی. |
| بخر | Offensive | بۆگەنی لەش. بۆندڕن. |
| بخر الفم | Bad breath | بۆگەنی دەم. |
| بخرة-بخراء | Orobusrose | (ئۆروبەس ڕۆز) گیایەکە گوڵی پەمبەیی ئەگرێت، بۆ لەوەڕیش بەکاردێت. |
| بخس | Dirt cheap | هەرزان. |
| بخص | | گوانێك یا مەمکێك کە بەزەحمەت شیری لێ بێتەدەرێ. |
| بخصة | Eye sore | قنچکە سڵاوە، سیچکە سلاوە، دگدگە. |
| بخق | | کەروێشکە خەو، چاو نەنوقاندن لە کاتی نووستندا. |

| | | |
|---|---|---|
| بخورية | Boswellia | (بورسەر) بفورد. |
| بخور- بخورد | Incense | (ئینسینس) بفورد، مادەیەکی زەمقی‌یە بەری گیایەکە ئەگەر بسووتێنرێت بۆنێکی خۆش ئەدات. |
| بخور الاكراد، شمر الخنازير | | (ئەندراسیۆن) بخوردی کوردی، جۆرە ڕووەکێکە ڕۆنی لێ ئەگیرێ. |
| بخور مريم | Cyclamen | (سایکلامین) چنگی، پەنجەی مەریەم، جۆرە گیایەکە گوڵێکی جوانی هەیە. |
| بخيل | Miser | رژد، بەخیل، چرویك، قەلس، چرووك. |
| بدائي | Primitive | سەرەتایی. |
| بدال | Money changer | سەڕاف، پارەگۆڕەر. |
| بدالة | Changer | گۆڕەر، بگۆڕ. |
| بداة- كماة | Truffle | (ترەڤل) دوومەلان. |
| بدانة | Corpulence | قەڵەوی، تێك سمڕاوی. |
| بداهة | Intuilion | زوو تێ گەیشتن. |
| بداية | Beginning | سەرەتا، دەمەدەم. |
| بداية التوريق | | سنوورچە، تازە دەرکردنی گەڵا لە لایەن درەخت و گژوگیاوە. |
| بداية الثلج | | پڕووشە، سەرەتای بەفر. |
| بدح | Wildfig | هەنجیرە کێویلە، درەختێکی دەشتەکی‌یە لە قەراغی باخ و جادەکان ئەروێنرێت بۆ ڕازاندنەوە و بەرهەڵستی ڕەشەبا. |
| بدرانج- دمع ايوب | Jobs tears | فرمێسکی ئەیوب، گیایەکە بەرەکەی سپی لە موروو دەچێت، دەکرێت بە تەزبیح. |
| بدر | Foll moon | هەیڤ، مانگی چواردەشەو. |
| بدري | | بارانی پەڵە. |
| بدسكان | Parkinsonia | (پارکینسۆنیا) دەوەنێکە گوڵێکی زەردی بۆن خۆش ئەگرێت. |
| بدقة | Minutely = accurately | بەووردی. |
| بدلاً عن | Instead of | لە جیاتی، لەبری، لە بریتی. |
| بدغة | Slow worm | (سلۆزرم) جۆرە مارمێلکەیەکە لەشی لوولەیی‌یەو پەلی نی‌یە، لەمار ئەچێت ژەهری نی‌یە بەشەو ئەگەڕێت مێش و مەگەز ئەخوات. |
| بدلة | Suit of clothes | قاتە جل. |
| بدن | Body | تەن، لەش، جەستە. |
| بدن- وعل | Ibex=wildgoat | (ئایبیکس) بزنەکێوی. |
| بدو | Nomads | سارا، بیاوان، کۆچەر، دەشتەکی. |
| بدوي | Nomad | کۆچەری، بیاوانی، دەشتەکی. |
| بدون انقطاع | Incessantly | بێ بڕانەوە، بێ دوایی، پەی دەرپەی. |
| بدون نهاية | Endless | بێ بڕانەوە، بێ کۆتایی. |
| بدون لب | Hollow | پووچ، پووت. |
| بدين | Corpulent | زەلام، تێکسمڕاو، بۆشناخ، کەتە، قەڵەو. |
| بديان | Illicium | (بادیان) داروەوەنێکە بەرەکەی دەنکی بادەمی‌ی سپی بۆن خۆشی تیایە. |
| بدين قصير | Short stout | خڕپن، خڕپیلانە. |
| بديهي | Intuition | ئاشکرا، بەڵگەنەویست. |

| | | |
|---|---|---|
| بديهية | Axiom | (ئەكسيۆم) بەڵگە نەویست، کردارێکی ماتماتیکی‌یە بەبێ بەڵگە ئەسەلمێنرێت. |
| بذار | Sowing | تۆو چاندن، داچاندن. |
| بذارة | Sower | (سۆوەر) ئامرازی تۆوچاندن. |
| بذج- حمل | Lamb | (لامپ) بەرخ. |
| بذرة | Seed | تۆو، دەنك. |
| بذرة جافة | Dry seed | تۆوی ووشك، ووشكە تۆو. |
| بذرة طرية | Wet seed | تۆوی تەڕ، تەڕە تۆو. |
| بذرة عذراء | Virgin seed | باتۆو، تۆوی دروست بوو بەبێ جووت گرتن. |
| بذر | Sowing | (سۆوینك) تۆوكردن، تۆوچاندن. |
| بذر قطونا | Flea wort | ئەسپەنەر، ئەسپەرزە. |
| بذريات | Seed bearers = spermatophyto | تۆوەکی‌یەکان، تۆودارەکان، کۆمەڵێکن لە رووەك تۆویان هەیە. |
| بذل | Spending | بەخشین. |
| بذيء | Unclean | پیسی. |
| بر- برة- حنطة | Wheat | گەنم، نانی جۆ. |
| بر | Land | (لاند) زەوی، دەشت، بووم، ووشکانی. |
| برء | Recovery | چاك بوونەوە. |
| براءة ذمة | Innocence = acquittance | گەردن ئازادی، پاکانەی ئەستۆ. |
| براءة الاختراع | License | (پانینت) بڕوانامەی داهێنان، بڕوانامەیەکە مـیری ئـەی بەخشێت بەو کەسانەی شتی تازە دائەهێنن. |
| برائل | Hackel | (هاکل) پەڕی دەوری ملی باڵندە. |
| براد | Fitter | (فیتەر). ئەو کەسەی ئیش لە ئامرازی ئاسندا دەکات. |
| براندي | Brandy | (برەندی)، جۆرێکە لە مەی‌ی ترێ. |
| براك- خرمان | Garfish | (گارفیش) ماسی‌یەکی لمۆز درێژە. |
| براكيكتين | | (براکیکیتۆن) درەختێکە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە بەکاردێت. |
| براسيوديميوم | Praseodymium | (پراسیۆدیمیۆم) توخمێکی کیمیاگەری‌یە کێشی ئەتۆمی‌یەکەی "١٤٠/٩"و ژمارەی ئەتۆمی‌یەکـەی "٥٩"یـە، کانزایەکە ڕەنگەکـەی زەردێکـی کاڵـە، ماناکـەی "براسـیۆس دایدیمـۆس" واتـە "بـرای سـەوز" ئەگرێتـەوە. نیشانەکەی (Pr)ە. |
| برام | | (تارسۆنیمید) مێرووی‌یەکی سوودبەخشە. |
| براميسيوم | Paramecium | (پەرامیسێوم)، گیاندارێکی سەرەتایی یەك خانەیی‌یە لە ئاوو شوێنی شێ دارا ئەژی. |
| براميس- ابراميس | Bream | (برییم) جۆرە ماسی‌یەکە. |
| برباريس-انبرباريس- عود الريح | Barberry | (بـاربێری، بێربـێرس)، دەوەنێکـە قەدەکـەی خۆڵەمێشـی و دڕکاوی‌یـە گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی شۆڕی زەردی بۆن تیژە، بەرەکەی خـڕو سورە، دەرمانی لێ دەرئەهێنرێ - زریشك |
| بربري | Beriberi | (بیری بیری)، نەخۆشی‌یەکی پێستە لـە کـەمی ڤیتـامین "B"یـەوە ئـەبێ، بریتی‌یە لە ئاوسانی دەمارو ئیفلیجی‌ی ماسوولکەو نەمانی هەست. |
| بربارة- جرجير البر | Trickle mustard | (تریکل مەستارد) ڕووەکی خەرتەلە. |

| | | |
|---|---|---|
| بريال- دب امريكي | American bear | (باريبالْ) وورچي ئەمريكي. |
| برين | Akind of dates | جۆرێكە لە خورما. |
| بريين | Purslane | (پۆرسلێن) پەڵپينە. |
| بربختي- حرباء | Chameleon | (جاميليون) خۆرپەرست، تپ تپە. |
| بربخ | Culvert | (كەڵڤێرت) (ئيپيديديميس) بربتي‌يە لە بۆرييەكي پێچاو پێچ كە ئاوي نێر لە گونەوە ئەبات بۆ توورەكەي ئاوي نێر، بۆري گون. |
| بربشكة، آذان الدب | Verbascum | (ڤێرباسكە) گوێ وورچە، ڕووەكێكي ناوچە گەرمەكانە بۆ ئازاري جومگە و چاو بەكاردێ و زۆر ژەهرە. |
| بربرين | Berbarine | (بەربەرين) (ڤێربينـا) مادەيەكـە لـە توێكڵـي داري "برباريسـي" دەردێ بـۆ بەهێزكردني بۆري خوێن و تەوژمي خوێن بەكارئەهێنرێت. |
| بربيرز | | جۆرێكە لە نەخۆشي ئيفليجي لە هيندستان بڵاوئەبێتەوە. |
| بربط - مزهر | Lute | تەمووره، جۆرێكە لە عوود. |
| بربط | | جۆره ماسي‌يەكە. |
| بربور | | بروێش. |
| بربور | Red mullet | جۆره ماسي‌يەكە لە مارماسي ئەچێت. |
| برت | Pruning shears | (بێڵ هۆك، هيدگ بێڵ) چەقۆي درەخت هەڵپاچين. |
| برة | Caryopsis | (كاريوبسيس) جۆره بەرێكە توێكڵەكەي نووساوه بە توێكڵي تۆومكـەوه. وەك گەنم و جۆ. |
| برتقال- برتقان- بردقان= جنة | Common orange | (كۆمۆن ئۆرانج) پرتەقاڵ، درەختێكە، خۆشترين بەره، ئەخورێت و ئەكرێت بەشەربەت و مەي. |
| برتقال حلو | Sweet orange | پرتەقاڵي شيرين، ليمۆي شيرين. |
| برتقال مر | Bitter orange | نارنج - درەختێكە لە كۆمەڵەي پرتەقاڵ بەرەكەي كەمێك تاڵە. |
| برتريين | | (پيرتـەريين)، دەرمانێكە لە ڕووەكي (پێرتـێرم) دەرئەهێنرێت دژي مێـش و مەگەز بەكاردێت. |
| برترم | | (پێتـێرم) ڕووەكێكـە دەرمـاني (پيرتـەريين)ي لـێ دەرئـەهێنرێت كـە دژي مێش و مەگەز بەكاردێت. |
| برثن- براثن | Claw | "كلۆ" چنگ، چڕنووك، مێخ، نينۆك، ڕنۆك. |
| برج | Tower | كەلوو، بورج (تاوەر)، قونگره، قولله، بارو، قەڵات يان خانوويەكي بەرزه لە شێوەيەكي چوار گۆشە يان خڕه، ساختمانێكي بەرز. |
| برج | Constellation | (كۆنستيلێشن) كەلوو، كۆمەڵە ئەستێرەيەك لە وێنەي شتومەك دا. |
| برج الثور | Taurus (bull) | (تاوروس) كەلووي گا، بورجي گا. |
| برج الحمل | Aries (ram) | (ئاريس) كەلووي بەرخ، بورجي بەرخ. |
| برج الجوزاء- برج التوامان | Gemini (Twins) | (توينس) كەلووي دوو هاوزا، بورجي دوو هاوزا، كەلووي ئاسمان "جوزاء" ئەستێرەيەكي دووري بەرزه. |
| برج السرطان | Cancer (crab) | (كانسەر)، كەلووي قرژاڵ، بورجي قرژاڵ. |
| برج الاسد - برج الليث | Leo (lion) | (ليۆ) كەلووي شێر، بورجي شێر. |
| برج العذراء- برج السنبلة | Virgo | (ڤيرگۆ) كەلووي گوڵە جۆ يا گەنم، بورجي كەنيشك. |
| برج الميزان | Libra (balance) | (ليبرا) كەلووي تەرازوو، بورجي تەرازوو. |

| | | |
|---|---|---|
| برج العقرب | Scorpio (scorpion) | (سكۆرپیۆ) کەلووی دوپشك، بورجی دووپشك. ئاپان، جووتەی هەنجیران. |
| برج القوس | Archer | (ئەرچەر) کەلووی کەوان، بورجی کەوان. |
| برج الجدي | Capricornus (goat) | (گۆت) کەلووی کارژۆڵە، بورجی کارژۆڵە. |
| برج الدلو | Aquarius (water bearen) | (ئەکواریس) کەلووی دۆلکە، بورجی دۆلکە. |
| برج الحوت | Pisces (fishes) | (پیسیس) کەلووی نەهەنگ، بورجی نەهەنگ - بورجی ماسی. |
| برج العجوز | | کەلووی پیرێژن، بورجی پیرێژن. |
| برج التبريد | | کەلووی ساردکردنەوە. |
| برج الكبش | | بورجی بەران. |
| برج الاسلاك الكهربائية | | کەلووی تەلی کارەبا. |
| برج الرامي | Sagittaris = archer | کەلووی تیرئەنداز، بورجی تیرئەنداز، کەلووی تیرهاوێژ، بورجی تیر هاوێژ. |
| برج السنبلة | Virgo | کەلووی هێشوو. |
| برج كوكبة | | کەلووی ئەستێرە. |
| برجمة | Knuckle | (کنەگل) جومگە. گرێی پەنجە. |
| برجيرون | | (بەرچیرۆن)، جۆرێکە لە ئەسپ. |
| برجية- زنبق برونو | Lily | (برۆنوس لیلی) زەمقی برۆنۆ، جۆرێکە لە ڕووەکی زەمق. |
| برجام- برجيم | | پەرچدانەوە. |
| برجاموت | Bergamot | (بیرگاموت) جۆرێکە لە پرتەقاڵ ڕۆن لە توێکڵی بەرەکەی دەرئەهێنرێ بۆ دروست کردنی عەتر. |
| برجد | | جاجم، جل و بەرگی ئەستوری هێڵدار. |
| برج التقطير التجزيئي | | کەلووی دڵۆپاندنی پارچە پارچەکردن. |
| برجيس | | ئەستێرەیەکی گەرۆکە. |
| برجال | Compasses | پرگاڵ. |
| برجة | She camel | ووشتری مێ. |
| برد | Coldness | سەرما، ساردی، سۆڵە، تووش. |
| برد | Hail | (هایل) (هێڵ) تەرزە، تەزرە، تەیرۆك. |
| برد شديد | | سەرمای سەخت، بادەوە، تووش، سەرماو سۆڵە. |
| برد | Fitting | باریك کردن و تەنك کردنەوەی ئاسن بەبڕبەند. |
| برداء= ملاريا | Malaria | لەرزوتا یان تۆف و سەرمای سەخت. |
| بردي= بابير- بابيروس | Papyrus | (پاپیرۆس)، تەرکە، قەرەم. ڕووەکێکی ئاوییە لە قامیش ئەچێت، لاسکێکی بەیەکاچووی هەیە، توێکڵەکەی بۆ نووسین بەکارئەهێنرێ، گوڵەکانیشی بچووك وتێك ئاڵاوون. |
| برد قوش بريّ - مرد توش | Wild marjoram | (وایلد مارجورام) ڕووەکێکی بۆن خۆشە لە هاویندا گوڵ ئەکات بەشێوەی بەهارات بەکاردێت - مەرزنگوش. |
| برذعة | Pack sadle | کورتان، پالان، کۆپان. |
| برذون | Draft horse | (پاك هۆرس) بارگیر، ئێستری بار (هێنی). |
| برزخ | Isthmus | تەنگە زەوی، پارچە زەوییەکی تەسکە کەوتۆتە نێوانی دوو دەریاوە. |
| برسية | Gnaphalium | (گنافالیۆم) پێ پشیلە گیایەکە گەڵاکەی بچووکە و تیژە مووی پێوەیە، گوڵەکەی بە شێوەی هێشوی سپی و سورە، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| برسيم | Clover | (کلۆڤەر) دانۆك، وێنجە، بارێزە، سێ پەرە، (ئەلفا ئەلفا) گیادانك. |
| برساء | Persea | (میمۆسۆیس) درەختێکی رازاندنەوەیە گوڵی سپی یان زەرد ئەگرێ. |
| برس | | درەختێکی وڵاتە گەرمەکانە زەمقی لێ دەرئەهێنرێت. |
| برس- قطن | Cotton | (کۆتن) لۆکە. |
| برسام- ذات الجنب | Pleurisy | (پلووریس) نەخۆشییەکە تووشی پەردەی سی ئەبێت، برك، ئاوسانی پەردەی سی، ئاوسانی پەردەی نێوانی جگەرو دڵ. |
| برساء هيندي- قشدة هندية | | (بوکول تری) درەختێکە بەرەکەی لە پرتەقاڵ ئەچێت و مەیلەو ڕەشە و ئەخورێت و قەدەکەی زەمقی لێ دەردێت. |
| برستاتة- بروستات | Prostate | (پرۆستات) لوویەکە دەوری بۆری میزە ڕۆیداوە لە ژێر میزەڵانەوە، شلەیەك دەرئەدات و تێکەڵی ئاوی پیاوی ئەکات. |
| برسوم- قصب السكر | Sugarcane | (سوگرکێن) قامیشی شەکر. |
| برش | Door mat | (دۆرمات) کومباری قاچ سڕین. |
| برش | | پەڵەیەکی سپییە لە بێخی نینۆك پەیدا ئەبێ، پەڵەی سەر پێست. |
| برشت | Soft boiled | برشت، دەڵەمە، نیوە برژاو، هێلکەی نیوە برژاو. |
| برشام | Wafer | (وێفەر) هەویری لکاندن. |
| برشام "مسمار" | Rivet | (رایڤێت) بزماری پەرچ دراو، بزماری پەرچ. |
| برشان | Spotted | پەڵەپەڵە، پنکە پنکە، بەڵەك، شل. |
| برص | Leprosy | (لیپروسی) گولی، ئاڵە، بەڵەکی، نەخۆشییەکی درمییە گرێ پەیدا ئەکات لە سەر پێست و دەم و چاو، وە لە دواییدا ئەیکات بە برین، وە دەست و پەل و دەم و چاوی نەخۆشەکە ناشرین ئەکات. |
| برص الجدار | Wall gecko | (وۆل جیکۆ) شەوگەرد. |
| برص | Al bino | نەبوونی ڕەنگ لە پێستدا. |
| برطام | Lip thick | (لیپ ثیك) لچی ئەستوور. |
| برطم | | (ئەکالیفا) درەختێکە چەند لقێکی لە زەوییەوە لێ دێتە دەرەوە، بەرز ئەبنەوەو گەڵاکەی تەنکە، بەرەکەی درێژکۆلەیەو نەرمە و ئەخورێ. |
| برطوم | Stop plank | (ستۆپ پلانك) نیرگە، نیرگەی دارڕای سەربان. |
| برعان | Roach | جۆرە ماسییەکی رووباری و دەریاییە، پێستی سەوزو ژێر سکی سپییە. |
| برعم | Bud | گۆیکە، چرۆ، خونچە، پاژە ڕەمز، پۆخ. |
| برعم زهري | Floral bud | خونچە، گۆیکەی گوڵ. |
| برعم ورقي | Leaf bud | چرۆ، گۆیکە، گۆبیتە، گۆیکەی گەڵا. |
| برعم الذوق | Taste bud | گۆیکەی چەشتن، مەمیلەی چەشتن. |
| برعم غير متفتح | | گۆیکەی نەپشکوتوو، غونچەی نەکراوە، پوخ. |
| برعم نهائي- برعم طرفي | Terminal bud | (تێرمینال بەد) گۆیکەی سەر چڵ، گۆیکەی پۆپە. |
| برعم مختلط | Mixed bud | گۆیکەی تێکەڵاو. |
| برعم جانبي "ابطي" | Axillary bud | گۆیکەی لاتەنیشت، گۆیکە باخەڵ. |
| برعم عرضي | Accidental bud | گۆیکەی لابەلا. |
| برعم حرشفي | Scale bud | (سکۆیمەس بەد) گۆیکەی تونێکڵ دار. |
| برعم دائري | Circylar bud | گۆیکەی بازنەیی. |

| | | |
|---|---|---|
| برغموت- ليمون اضاليا | Bergamot | (بیرگاموت) جۆرێکە لە درەختی پرتەقاڵ. |
| برغن- برغز | Wild cow (child) | بەچکەی مانگا کێوی. |
| برغل | Bruised wheat | ساوەر، ساوار. |
| برغل ناعم | Soft bruised wheat | پیرخەنیلە، سندك، پەتلە. |
| برغوث | Flea | (فلی) کێچ، گەستنەکەی خورو پەیدا ئەکا جاری وا هەیە نەخۆشی سنتان "طاعون" بلاوئەکاتەوە. |
| برغوث البحر | Shrimp | (شریمپ) ڕۆبیان، کێچی دەریا. |
| برغوث الرمل | Sand flea | کێچی لم، لە کەناری دەریاکاندا ئەژی. |
| برغوث الماء | Water flea | (ۆتەر فلی) جۆرە کێچێکی ئاوییە لەلایەن ماسییەوە ئەخورێت. |
| برغي | Screw | (سکروو) جەر، بورغو. |
| برغشة | Mosquito | (مۆسکیتۆ) مێشوولە. |
| برغش | Gnats | (گناتس) جۆرێکە لە مێشوولە، شەوسووتکە، پەخشە، ئاخۆرە، پیشوو کورك، مێشوولەی وورد. |
| برغش الخيل | Horses gnat | مێشی وولاخ. |
| برقة | | (باربیس) جۆرێکە لە قارچك ئەخورێت. |
| برق- برقية | Lightning | (لایتنینگ) بروسکە، تریشقە، چەخماخە، بەتاڵکردنەوەی کارەبا ڕووناکی لە ئاسماندا پەیدا ئەکات. |
| برقية لاسلكية | Telegram | (تیلیگرام) بروسکەی بێ تەل. |
| برقع | Veil | پەچە، ڕووپۆش، تارا، سەرپۆش. |
| برقوق | Plum | (پلەم، پرۆن) هەلوژە، ترقە، ئارژەنگ، هەلوژەی ووردی زەرد، هەرمێ لۆچکێنە، خێخك. |
| برقوق جبلي | Mountain plum | بەلاڵووك. |
| برقش- شرشور | Finch=bishop bird | (فینچ) باڵندەیەکی بچووکی دەنگ خۆشە پەرەکەی ڕەنگینە. |
| برقو | | نەخۆشییەکی تایبەتییە لە ئوسترالیا بلاو ئەبێتەوە، نیشانەکەی دڵ تێکەڵ هاتن و ڕشانەوەیە. |
| برقوق عربي- برقوق بري | Spondias | (سپوندیاس) چەقالە، شفشك، هەلوژە کێویلە. |
| برك | Sailing boat | کەشتیی سێ ستوونیی چارۆکەیی. |
| برك اسنة | Stag nation | زۆنگ، زەلکاو، زۆنگاوی بۆگەن. |
| بركان | Volcano | (ڤۆلکانۆ)، چیا یا کێوی ئاگرین، بورکان. |
| بركة- خضاري | Mallard | (مالارد) مراوی کێوی. |
| بركة | Pool | (پوول) گولاو، گۆماو، گۆم، ئەستێرك، چالاو، پەنگاو، ئەستێل، ئاوگێر. |
| بركار | Compasses | پەرگال، پرگال، پەرگار. |
| بركليوم | Bekelium | نیشانەکەی (BK) (بێرکلیۆم) توخمێکی کیمیاگەری تیشك دەرەوەیە کێشی ئەتۆمییەکەی "٢٤٧" یان "٢٤٥"ە و ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٩٧) کانزایەکی دەستکردە، ناوەکەی لە ووشەی "برکلی"، کالیفۆرنیا وەرگیراوە. |
| بركلورات | Perchlorate | (پێرکلۆرەیت)، خوێی پەرکلۆریك ئەسید. |
| بركيورس- اكاري | | (بارکیورس) جۆرێکە لە مەیمون. |
| بركان خامد | Quiet = silent volcano | بورکانی خامۆش. |

| | | |
|---|---|---|
| بركية | Parkia | (پاركيا) جۆرێكه له ڕووەك، گوڵەكەی سووره و بەرەكەی لە فاسوولیا ئەچێت و درێژە، دەنكەكەی وەك قاوە بەكار دێت. |
| برلمان | Parliament | (پارلیمینت)، پەرلەمان، ئەنجومەنی نوێنەران. |
| برلون | | (پەرلۆن)، جۆره قوماشێكه له نایلۆن ئەچێت هەر چەندە وەك نایلۆن بەرگە ناگرێت. |
| برمائي- برمائيات- قازب | Amphibian | (ئەمفیبیان) تەڕو ووشكی، گیانداری تەڕو ووشكی وەكوو بۆق. |
| برموتايت | Permutit | (پیرمۆتایت)، دەرمانێكە بۆ لابردنی ناسازی ئاو. |
| برميل | Barrel | (باریل)، بۆشكە، بەرمیل، پیپ، چەڵەنگ، واریل، كەمۆڵە. |
| برم | To twist | بادان، جەڕاندن. |
| برمنكنات | Per manganate | (پیرمەنگەنەیت)، خوێی پیرمەنگەنیك ئەسید، مادەیەكی ئۆكسید كەرە. |
| برمائي عديم الاطراف | Amphiloia with out legs | گیاندارێكی تەڕو ووشكیی بێ قاچە. |
| برموس- خنفساء كاتبة- نضارية الكرمة | Anomala vitis = eumolpus vitis | (برۆمیۆس) قالۆنچەیەكی بچووكە زیان بە درەختی مێو ئەگەیەنێت. |
| برموق | Anemone | گوڵاڵە، گوڵە نیسان، گوڵە مێلاقە = گوڵاڵە سوورە. |
| برمودية | | (ئایدگراس) ڕووەكێكە قەدی ژێر زەوی هەیە. |
| برمائية | | ئۆتۆمبێلی تەڕو ووشكی، جۆرە ئۆتۆمبێلێكە توانای هەیە بە ئاوو زەویشدا بڕوات. |
| برم | Restlessness | وەڕس، بێزاری. |
| برميل الخبز | Barrel of bread | نانگێن. |
| برمي | Permian | (پیرمی) سەردەمێكی جیۆلۆجی كۆنە. |
| برنق- برنج | | (ئیمبیلیا) ڕووەكێكی دەشتەكی و كشتوكاڵییە، گوڵەكەی هێشوویی‌یەو بەرەكەی ئەخورێت و ئەكرێت بە مرەبا. |
| برنق | Bronco | (برونكو)، جۆرە ئەسپێكی ئەمریكیی گرگنە (بچووكە) زۆر ماڵی نەبووە. |
| برنيطة | Hat | كڵاو، شەفقە، شەپقە. |
| برنس- برنص | Burnoox = burnous | برنووس، خاولی گەرماو كەقۆچكەی پێوە بێت، جبە، كەوا، باڵا پۆش. |
| برني | Chicken | (كۆكریل) فروج، كەڵەشێری بچووك. |
| برنية | Earthen ware | كوپە. |
| برنقيل | Barnacle | (بارناكل)، گیاندارێكی دەریایی توێكڵ دارە قاچەكانی بڕژانگ دارن بە بەردەوە ئەنووسێت. |
| برنوف - طباق البراغيث | Flea bane | (لیدبیس گلۆفیس) شاهبانج، شابان، گیایەكی دەشتەكی و پزیشكی‌یە. |
| برنيق- فرس النهر | Hippopotamus | ئەسپی ئاوی، ماینی ئاوی، گیاندارێكی كەتەی سەر زلە قاچ و كلكی كورتە، چوار سمی هەیە لە ڕووباردا ئەژی. |
| برنيق | Varnish | وەرنیش. |
| برنتية | Wild goose | قازی كێوی. |
| برنوف - شاهبانج | Flea bane | شابانە، وەنەوشە سەگانە. |
| برنامج | Program | (پرۆگرام)، بەرنامە. |
| برنج | Bronze | زەرد، مسی زەرد، دارشتەی مس و توتیا. |
| برهام | Albizzia | (ئەلبیزیا)، درەختی نوێنمەك. |

| | | |
|---|---|---|
| برمة | Moment | سات، دەمێکی کەم. |
| برهان | Proof | سەلماندن، بەلسا، پاژە، بەڵگە، لە بەڵگەو یاساوە. |
| برهلة | Perihelion | (پیریهیلیۆن) نزیکترین شوێنی ئەستێرەی گەڕۆکە لە خۆرەوە. |
| برهان - فرفر | Gallinule | (گالینیول، پورفیریو)، باڵندەیەکی ئاوی شینی مەیلەو بنەوشەییە دەنوك‌و قاچی سوورە. |
| بروز | Projection | چوکڵە، بەرزایی. |
| بروش | Brooch | (برووچ) دەرزی سنجاق، دەرزیلە. |
| برونز- برونس | Bronze | (برونز) تونج، توج، زەرد، تێکەڵاوێکە لە مس و تەنەکە بۆ دروست کردنی زەنگ و پەیکەر بەکاردێت. |
| برواق- بروق- سریش | Asphodel | (ئەسفودیل) ڕووەکێکی قەد درێژە گوڵی زۆرە بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت. |
| بروتوزوا | Protozoa | (پرۆتۆزووا)، گیاندارە یەك خانەییەکان. |
| برواز | Frame | پەراوێز، چوارچێوە، چەمەرە. |
| بروتيوس | | (پروتیوس)، گیاندارێکی تەڕ و ووشکییە. |
| بروفيسور | Professor | "پروفیسور". مامۆستای زانکۆ. |
| بروك | To knee down | چۆك دادان، لەسەر ئەژنۆ وەستان. |
| بروثرومبين | Prothrombin | (پروثرومبین) مادەیەکە لە خوێنا یارمەتی مەیینی خوێن ئەدات. |
| بروتوثلازم | Protoplasm | (پرۆتۆپلازم) یەکەم مادەی ژیان، مادەی زیندوو. |
| بروجكتور | Prpjector | (پروجیکتۆر)، مەکینەی سینەما. |
| بروتاكتينيوم Pa | Protactinium | (پروتاکتینیۆم) توخمێکی کیمیاگەری تیشکدەرەوەیە کێشی ئەتۆمییەکەی (٢٣١)و ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٩١) کانزایەکە ڕەنگێکی خۆڵەمێشی هەیە ماناکەی "پروتوس ئەکتینیۆم" واتا "تیشکی یەکەم" ئەگرێتەوە. |
| بروق | | ڕووەکێکە لە کۆمەڵی (زەمەق) گوڵەکەی سپی یا مێخەکی یان زەردە. |
| برونتصور | Brontosaurus | (برونتسۆرەس) گیاندارێکی خشۆکی کەتەی قڕتن کەوتووە. |
| برومثيوم Pm | Promethium | (پرۆمیثیۆم) توخمێکی کیمیاگەری کانزایە کێشی ئەتۆمییەکەی (١٤٧) و ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٦١). ماناکەی (پرۆمثیوس) خوداوەندی ئەغریقییە کۆنەکان ئەگرێتەوە. |
| برودة | Coldness | ساردی، ساردایی، لەرز، سەرما. |
| برودة الدم | | خوێن ساردی. |
| بروفة | Proof | پڕاوە، پەراوەی جل. |
| بروجستيرون | Progesterone | (پرۆجستین) ئەو هۆرمۆنەیە کە منداڵدان ئامادە ئەکات بۆ هاتنی گەرای چاکرلو. |
| برونشيت- نزلة شعبية | Bron chitis | (برۆنشیتیس) ئاوسانی بۆری هەوا لە سنگدا، نەخۆشی تەنگە نەفەسی. |
| بروبيلين- بروبين | Propylene | (پرۆپیلین، پرۆپین) هایدرۆکاربۆنێکی ئۆلیفینی گازییە زوو گڕ ئەگرێت. |
| بروميد | Bromide | (برۆمید) خوێیەکە لە برۆمین و کانزا، خوێی هایدرۆبرۆمیك ئەسید، بۆ مەبەستی وێنەگرتن و دەرمان بەکاردێت. |
| بروة الصابون | Soap remnant | بنیسکە سابوون. |
| بروتين | Protein | (پرۆتین) مادەیەکی ئۆرگانیکی ئاڵۆزە، کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین و نایترۆجینی تیایە، لە شیرو هێلکەو گۆشتدا هەیە. |
| بروتانوبيا | Protanopia | پرۆتانۆپیا، ڕەنگ کوێری، ئەو کەسە ڕەنگی سور نابینێت. |

| | | |
|---|---|---|
| بروتون | Proton | (پرۆتۆن) پارچەیەکە لە ناوکی ئەتۆمی هەموو توخمێکدا هەیە، کارەبای گەرمی لەسەرە کێشەکەی (١٨٤٠) ئەوەندەی کێشی ئەلەکترۆنە. |
| بروبان | Propane | (پرۆپان) گازێکی بێ ڕەنگە لە هایدرۆجین و کاربۆن پێکهاتووە، سێ ئەتۆم کاربۆن و هەشت ئەتۆم هایدرۆجینی تیایە، بۆ سوتەمەنی بەکاردێت. |
| بروتين نووي | Nucleoprotien | (نیوکلیك پرۆتین) پرۆتینی ناووکی. |
| بروتوبلاست | Protoplast | (پرۆتۆپلاست)، پرۆتۆپلازمی ناوەوەی خانە. |
| بروسين | | (برۆسین) ئاوێتەیەکی قلْیەیی ژەهرە لە گوێزی ڕشانەوە دەرئەهێنرێت. |
| بروكامبيوم | Procambium | (پرۆکامبیۆم)، کامبیۆمی سەرەتایی. |
| بروم Br | Bromine | (برۆمین)، توخمێکی ساکاییناکانزایە بەشێوەی شلەیەکی سووری ژەهری بۆگەن، ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٣٥)ەو کێشی ئەتۆمییەکەی (٧٩/٩)یە ناوەکەی لە وشەی (برۆموس) واتا (بۆگەن) وەرگیراوە. |
| بروفاليه | Browallia | (برۆوالیا) ڕووەکێکە گوڵی سپی یا شین یان بنەوشەیی ئەگرێت. |
| بروميد الاثيل | Ethyl bromide | (ئەثیل برۆماید)، دەرمانی مێش و مەگەز. |
| بروستات | Prostate | (پروستەیت). |
| بري | Wild | کێوی، دەشتەکی، ووشکانی، کێویلە، ڕۆیل. |
| بريء | Exempt from = innocet | بێ تاوان، بێ گوناه. |
| بريد | Post | (پۆست) پۆستە، پەیك، چەپەر، بەرید. |
| برق | Light ning | بریسکە. بریسکانەوە، شەوقدانەوە، درەوشانەوە، ورشە. |
| بری | Wild= savage | (وایڵد، سافیج) گیاندار یا ڕووەکی زەوی یا کێوی یان دەشتەکی. |
| بريتون | Peritoneum | (پێریتۆن)، پەردەیەکی لینجی ڕوونە بۆشاییو ئەندامەکانی ناوسکی داپۆشیوە. |
| بريليوم Be، غلوسينيوم GL | Beryllium | (کلۆسینیۆم، بریلیۆم) توخمێکی کیمیاگەرییە کێشی ئەتۆمییەکەی (٩)یەو ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٤)ە کانزایەکی سپی زیوییە ماناکەی لە وشەیەکی کۆنەوە وەرگیراوە (بریل). |
| بريمة بزال | Corkscrew | (کورك سکروو) بزماری تەپەدۆر دەرهێنان. |
| بريمة | Gimlet | (جیملێت) سمۆ، بزماری پێچاوپێچ، ئەسکەنە. |
| بريسكوب | Periscope | (پریسکۆپ) دووربینی ئاسۆ، دووربینی کەشتی ژێر ئاو، جۆرە دوور بینێکە بەکاردێت بۆ بینینی شتومەك لە پشت کۆسپەوە. |
| بري | Sharpen | دادان، تیژکردن. |
| بريباتس | Peripatus | (پریپاتس)، جۆرە گیاندارێکی نەرمە قاچی بەسکیەوەیەتی. |
| بري بري | Beri beri | (بێری بێری)، نەخۆشییەکە لە کەمی ڤیتامین (بی-١) وە ئەبێت، کە لە توێکڵی برنج دا هەیە، لە نیشانەکانی ئاوسانی قاچ و قۆڵ و دەم و چاوە، هەروەها ئازاری ماسوولکەو پشێوی دڵ و ئیفلیجییە. |
| بريزة- قصفة | | (بریزا) گیایەکی دەشتەکییە لە کۆمەڵەی دەغڵودان. |
| بريس | | (باریس) جۆرێکە لە مۆرانەی ڕووەك. |
| بريصة | Lizard | مارمێلکە. |
| بز | | (لووتوو) جۆرە ماسییەکە. |
| بزّ | Clothes | کوتاڵی لۆکەو کەتان. |

| | | |
|---|---|---|
| بزْ | Breast= Chest | گوان، مەمك. |
| بزاة | | (ئەكسيپيتريس) كۆمەڵەی هەڵۆ، بریتی‌یە لە بازو واشە. |
| بزة | | (زیگاینا) مێروویەكی زیان بەخشە بە ڕووەك. |
| بزاز | Cloth merchant = draper | بازرگان، كوتاڵ فرۆش. |
| بزاز العذراء | | (كاسیدۆنی) گیایەكی جوانە. |
| بزاق | Snail= Slugs | (سنێل، سلەگس) گیاندارێكی نەرمە لە كۆمەڵەی شەیتانۆكە، گژوگیا ئەخوات. |
| بزاق الحديقة | Garden slug | شەیتانۆكەی باخچە. |
| بزال | Screw | (سكروو) برغو، هەتە، دارسم، بەریمە ئامڕازی داركون كردن، درەوش. |
| بزاليا | Peas | (پیی) پۆڵكە. |
| بزاليا زهرية | Flower pea | گوڵە عەتر، گوڵێكی ساڵانەیە، لە زستاندا زەردە، قەدەكەی خۆهەڵواسەرەو زبرەو تووكی هەیە، گەڵاكانی ئاوێتەیە، تەرز فرێ ئەدات بۆ خۆهەڵواسین، گوڵەكەی بۆنی عەتر ئەدات، ڕەنگی سوورو پەمبەیی و بنەوشەیی و شین و زەد و سپی هەیە، ئەبێ داری بۆ داچەقێنرێ بـۆ ئـەوەی خـۆی پـێ ڕاگـیر بكات. |
| بزباز الماء | | جۆرە هەورێك یان گێژەڵوكەیەكە بەسەر ئاوەوە، لە ڕەحەتی ئەچێت. |
| بزرة | Speed | (سیید) تۆو، دەنك. |
| بزراء | Prolific female | ژنی شفتەژێ، منداڵی زۆربێت. |
| بزر القلب | | جۆرە دەوەنێكـی دەشـتەكی‌یە، گـەڵاكانی كـورت و ئەسـتوورن لقـی زۆرەو گوڵەكەی لە گوڵاڵە سوورە ئەچێت، گۆپكەكەی لە گوان (مەمك) ئەچێت. |
| بزر - جرثومة | Germ | (جێرم). زیندەوەری سەرەتایی. |
| بزرنكوش | Marjoram | مرزنكوش، مرنقوش گیایـەكی تەمـەن درێـژە لقـی زۆری لـێ جیـا ئەبێتـەوە، گەڵاكانی بچووك و خڕو سەوزی مەیلەو خۆڵەمێشین، گوڵەكەی وورد و سپی‌یە، بۆن خۆشە، ئارەقەكەی ئەگیرێ و ئەكرێت بە دەرمانی بەهێزكەرو ووریاكەرەوە، هەروەها بۆ چارەسەركردنی پەڵەی نەخۆشی سوورێژە. |
| بزر قطونا- حشيشة البراغيث | Fleawort | (فلـی وورت) گیایـەكی پزیشـكی و پیشەسـازی‌یە لـە گـەڵاو گـوڵ و تۆوەكـەی مادەی زەمقی دەرئەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشكی و پیشەسازی. |
| بزق | Guitar=Harp | تەموورە. |
| بزقة القمر | Star Jelly | (نوستۆك، ستارجێلی)، جۆرە قەوزەیەكی لینجە ئەخورێ. |
| بزل | Drainage | رزگاربوون لەو ئاوەی كە زیاترە لە پێویستی كشتوكاڵ بەخێراترین كات و بە ڕێگەیەكی ئابووری. |
| بزل- بازل- وعل | Wild goat= Ibex | (بێزوارگوت، ئایبیكس)، جۆرێكە لە بزنە كێوی، گیاندارێكە باد زەهری لێ دەرئەهێنرێ. |
| بزل | Puncture | (پەنكچەر)، كون كردنی شتێكی كلۆر و دەرهێنانی ئەو شلەیەی كە تیایەتی. |
| بزموث Bi | Bismuth | (بزمـوث) بـۆ دروسـت كردنـی دەرمـان و دارشـتەو دام و دەزگـای ڕادار بەكاردێت، توخمێكـی كیمیاگەری‌یـە كێشـی ئەتۆمی‌یەكـەی "٢٠٩"یـەو ژمارەی ئەتۆمی‌یەكەی "٨٣"یە ماناكەی لە ووشەی "پولندە"وە وەرگیراوە. |
| بزون | Cat | پشیلە، كتك، گوربە. |
| بزوغ | | دەركەوتن، هەڵاتن. |
| بزيلا- بزلة- بزليا- بسله | Garden peas | (گاردن پیی) پۆڵكە. |

| | | |
|---|---|---|
| بس- بس | Cat | (كات) پشیلە. |
| بساط | Carpet = rug | قاڵی، بەرە، ڕایەخ، ڕاخەر، كلیم. |
| بساط قطن | Carpet | كلیم. |
| بساری | Racoon | (باساریس) جۆرێكە لە گیانداری (ڕاكوون) شیردەرەو لەشی باریكەو سەرو كلكی پانە. |
| بساطة | Simplicity | سادەیی- ساكاری. |
| بسال | | درەختێكە لە ڕۆژ هەڵاتی هیندستان ئەڕوێ، بەرەكەی بۆ دەرمانی كرم بەكارئەهێنرێ. |
| بسباج- حشيشة البغل | Mule wort | (هیمیونیت، میول ورت) گیا ئێستر، جۆرێكە لە ڕووەكی (فێرن). |
| بسبس- شوكران | Hemlock | (هیملوك) ڕووەكێكی ژەهرییە. |
| بسباسة - جوزبوا | Myristica | (مایریستیكا) واڵەك، درەختێكی شوێنە گەرمەكانە بەرێك ئەگرێت وەك گوێز وایە توێكڵەكەی بۆبەهارات و دەرمان بەكار ئەهێنرێت. |
| بسبايج- اضراس الكلب- عرقسوس | Liquorice | (كۆمۆن پۆلیپۆدی، لیكۆرس) بەلەك، ڕووەكێكی دەشتەكی و پزیشكی یە "قەدێكی قیتوكەڵایەكی ئاوێتەی لینجی هەیە". |
| بستان | Garden | باخ، باغچە، بێستان، بۆیان، دەحل. |
| بستان الكرم | Vine-yard | ڕەز، باخی مێو، باخە مێو. |
| بستاني | Gardner | باخەوان. |
| بسترة | Pasleurization | (پاستروزێشن، پەستەرە) ڕێگەی پاستوور بۆ پاك كردنەوەی شیر كە بریتییە لە كوڵاندنی شیرەكە لە قاپێكی سەر داخراودا بۆ ماوەی نیو سەعات هەتا پلەی "٦٥ی سەدی" و ساردكردنەوەی بە گورجی. |
| بستوقة - جرّة | Earthen = vessel | دیزە، كووپە، كووپەڵە. |
| بسد- مرجان | Coral | (كورال) مەرجان، شیلان. |
| بسر | Unripe dates | خورمای نەگەییو، زۆڵەك، سیچكە، فەریكە، هاڵە، بەرسیلە، تەرە، كاڵ، میوەی پێنەگەیشتو. |
| بسط- بسط الكسر | Numerator | سەرە، سەرەی كەرت. |
| بسطرما - قدير اللحم | Biltong | باسترمە. خواردەمەنییەكە لە گۆشت و سیر. |
| بسق | | شیر زایین، "شیر تێزانی مەمك"، شیرزایینە مەمكەوە. |
| بسكويت | Biscuit | پسكیت، جۆرە شیرینییەكی ووشكە لە ئارد و شیرو شەكر دروست ئەكرێت. |
| بسلة- بسلي | Peas | (پییس، پیی) پۆڵكە، جۆرە ڕووەكێكە بەرەكەی لە نۆك ئەچێت سەوزە ئەكرێت بە چێشت. |
| بسلة حلوة | Sweet peas | پۆڵكەی شیرین. |
| بسلة هندية- لوبيا- قريناء | French bean | (پیگیون پی) لۆبیا - جۆرە سەوزەییەكە لە پاقلە دەچێت دەنكەكانی سپین. |
| بسوق | | گیاندارێكی مێ كە شیر زابێتە مەمكییەوە. |
| بسمة | Smile | بسكە، زەردەخەنە، خەندە. |
| بسيسة | | ئاوساجی، پەسیسە پەڵووڵە، ئاردو ڕۆن. |
| بسية | | درەختێكە لە ئەفریقا و هیندستان ئەڕوێ، گوڵەكەی بۆنی عەتری لێ دێت. |
| بسيط | Simple | سادە، ئاسان، ساكار، ساویلكە. |
| بسيل- باسيلي | Bacillus | (باسیلوس، باسیلەس) هەر باكتریایەك لە شێوەی چڵ و چێو وانا چیلكەدا بێت. |

| | | |
|---|---|---|
| بشاعة | Ugliness | ناشرینی، دزێوی. |
| بشامة | | جۆرە درەختێکە بۆن خۆشە گەڵاکەی قژ رەش ئەکات، لقەکانی بۆ ددان ئاژەنین "سیواك" بەکاردێت. |
| بشت القرد- حامول الماء | Horn wort | (هۆرن وۆرت) گیاکەڵەی ئاوی. |
| بشتة- حب العصافیر | Canary grass | (فلاریس، کاناری گراس) گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵ و دان بۆ مەبەستی لەوەڕ بەکار دێت، دەنکەکەی ئەدرێت بە چۆلەکە. |
| بشر | Human race | (هیومان بیینگ) ئادەمیزاد، مرۆڤ، مەردوم. |
| بشر | Wearing | ڕووگەشی، ڕووخۆشی. |
| بشری- بشارة | Good news = good omen | مژدە، مزگێنی، هەواڵی خۆش. |
| بشرة | Epidermis | (ئیپیدیرمیس، ئیـرم) ڕووی پێست، تـوێی پێست، توێکڵی پێست، توێژاڵی سەروی پێست. |
| بشروش- نحام- سرخاب- بشمور | Flamingo | (فلامینگو) سوورەقاز، سوورە قولنگ، باڵندەیەکی ئاوی مل و لاق درێژە، دەنووکی چەماوەیە، لەشی پەمبەییە، توانای ئەوەی هەیە کە ملی پێچاو پێچ بکات. |
| بشرة داخلية | Endodermis | (ئیندۆدێرم) توێژاڵی ناوەوەی پێست. |
| بشرة خارجية | Ectodermis | (ئیکزۆدێرم) توێژاڵی دەرەوەی پێست. |
| بشع | Ugly | ناشرین، دزێو، بە ئۆك، ڕەزاقورس، ئێسك قورس. |
| بشكير | Towel | خاولی. |
| بشملة- غبيراء | Loguat | (سێرڤس بێری) یەنگی دونیا، جۆرە درەختێکە بەرێکی خۆشی هەیە. |
| بشنين | Water lily= lotus | (لوتەس، واتەر لیلی) لیلوپەر. |
| بشنة- كنب | African- millet | (ئەفریکان میلیت) کزنی ئەفەریقی، گیایەکە بۆ لەوەڕ باشە هەروەها دەنکەکەی وەکوو گەنم و جۆ بەکاردێت. |
| بشورة- ابو الوشي | | (نیمفالید) جۆرە پەپوولەیەکی زیان بەخشە بە ڕووەك و ڕەنگاو ڕەنگە. |
| بشير | Announcer of good news | مژدەبەر. |
| بشير- ابو بشير | | (بیچیر) جۆرە ماسییەکە. |
| بصاق | Silva | (سالیڤا) تف، بەڵغەم، توگ. |
| بصاصة - عين | The eye | چاو. |
| بصة | To see | چاوپشکووتن، تەماشاکردن، بینین. |
| بصر | Eye sight | بینایی، دیدە، بینین، دیدەنی. |
| بصر | | (جاماگیکاس) جۆرێکی گەورەیە لە گوێچکە ماسی. |
| بصري | Ocular | بە بینین. |
| بصريات | Optics | (ئۆپتیکس)، زانستی ڕوناکی و بینین. |
| بصق | Tospit | تف کردن، بەڵغەم فڕێ دان. |
| بصل | Onion | (ئونێون) پیاز، پیواز، پیڤاز. |
| بصل صغير | Small onions | خلیسکە، سیچکە پیاز، کخس. |
| بصل لخضر | Spring onion | تەرە پیاز. |
| بصلة | Bulb = onion | (بەڵب)، (ئونێون). |
| بصل احمر | Tripolionion | سوورە پیاز. |

| | | |
|---|---|---|
| بصل الخنزير | Pigonion | كەڵپە، پیازە خوگانە، گلێخە. |
| بصل الحية- اشقيل الخريف | Autuman squill | (ئوتەمناڵ سكوێل) پیازە مارانە. |
| بصل الذئب | Tassel hyacinth | (تاسیل هایا كینت) پیازە گورگانە. |
| بصل الذهب | | پیشوك. |
| بصل الفأر- اشقيل | Sea onion | (سی ئۆنیون) پیازی دەریا، پیازە مشكانە، پیازۆكە، قوڕاوە، جافڵقێنە، بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| بصل العفريت- كراث نبطي | Wild leek | (وایڵد لییك) پیازی دێو. |
| بصل الحنش | African tulip | (ئەفریكان تیولیپ) ڕووەكی پیازە مارانە ڕووەكێكی پیازییە واتە سەلكی هەیە، دوو گەڵای گەورەی هەیە و گوڵەكەی سوورە. |
| بصل جبلي- بصل بري | Wild onion | پیازە كێویلە. |
| بصلة- بصيلة | Abulb | سەلك، پیازۆكە سەلكۆكە، پیازۆلكە. |
| بصلة سيسائية | Medula- oblangata | (مێدولا) مەغزی لاكێشەیی. |
| بصمة | Stamp | (ستامپ) باسمە چاپ. |
| بصمة الاصابع | Finger print | باسمەی پەنجە چاپی پەنجە. |
| بصوة | Fire brand | پشكۆ. |
| بصير | Discering | چاوتیژ، بیینا، زیرەك. |
| بصيرة | Minds eye | ووردبینی، دووربینی، پێش بینی، بینایی، زیرەكی. |
| بصيرة السلاح الناري | | مەگەزە. |
| بصيص النار | Glittering | تروسكەی ئاگر، پریشكی ئاگر. |
| بصيلة الشعر | Hair bulb | سەلكی موو، پیازۆلكەی موو. |
| بض | Haring adeticateskin | شل و مل، نەرم و نیان. |
| بضاعة | Goods | شتومەك، كوتاڵ، كەل و پەل، پرتاڵ، بابەت، شمەك. |
| بضباض، كماة | Truffle | (ترەفل) دوومەڵان. |
| بضع | Cut off | هەڵ دڕین، بڕین. |
| بضليا | | دەومنێكە خێرا گەورە ئەبێ، هەمیشە سەوزە، نزیكەی "٢/٥"م بەرز ئەبێتەوە، گوڵەكانی پەمبەیی و پەڵەی پرتەقاڵیان تیایە، بەشێوەی هێشوون، بۆ ڕازاندنەوەی باخچەكان ئەروێنرێت. |
| بطة | Duck | (دەك) مراوی، سۆنە، باریت، بۆرچین. |
| بط المناقع، بط وحشي | Wild duck | (وایڵد دەك، كانارد سافج) مراوی كێوی. |
| بطارية | Battery | (پاتری) پیل، دوو خانەی كارەبایی یان زیاتر كە پێكەوە بەسترابن، كۆمەڵە پیلێكن ووزەی كیمیایی ئەگۆڕن بۆ وزەی كارەبایی.كۆمەڵە تۆپێكە لە شوێنێكدا دائەنرێت بۆ لێدانی دوژمن بە بۆمبا. |
| بطارية السيارة | Battery of automobile | پاتریی ئۆتۆمبێل. |
| بطارية جافة | Dry battery | پیل، پاتری ووشك. |
| بطاطا- بطاطس- بطاطة | Potato | (پوتێتۆ) پەتاتە، كارتێنە، كرتۆپ، ڕتاخ، كرتۆپە، كارتۆل، سێڤە زەمینە، خڕكە گازوولە، پاكە پاكە. |
| بطاطا حلوة- بطاطس هيندي- قلقاس هندي | Sweet potato | (سویت پۆتێتو) پەتاتەی شیرین، سێوی بن ئەرز، ڕووەكێكە ئەروێنرێت، سەلكەكەی لە سەلكی پەتاتە ئەچێت و گەورەترە، هەندێكی شیرینە لە كەستانە ئەچێ. |

| | | |
|---|---|---|
| بطاح | Steppe | تەرایی وەكو گۆم و زونگاوو زەلكاو. |
| بطارية كهربائية | | (باتری) چەند پیلێكی كارەبایی پێكەوە ئەبەسترێ بۆ پەیدا كردنی تەوژمی كارەبا یان بۆ بەهێزكردنی كارەباكەیان. |
| بطاقة | Cart = ticket | (كارت) بلیت، پسووڵە. |
| بطانة | Lining | بەر، بەری كاڵا، پەراوێزی كەوا. |
| بطانة السترة | Lining of jacket | بەری چاكەت. |
| بطانة الفم | | پێستی ناودەم. |
| بطانة اللحاف | Lining | متیل |
| بطانية | Blanket | بەتانی، پەتو. |
| بطانية خفيفة | Light blanket | پۆپەشمین. |
| بط احمر | Red duck | سووره قانگ. |
| بط الخضاري | Green duck | سۆنە، جۆرە مراوییەكی سەوزە. |
| بطالة | Unemployment | بێ ئیشی، بی كاری، بەندەواری، بێ تۆر. |
| بط بري | Wild duck | سۆنە، مراوی سەر سەوز. |
| بطباط نيلي- نيله صينية | Chinese in digo | (چاینیس ئیندیگۆ) خومی چینی گیایەكی تەمەن درێژە خومی لێدەرئەهێنرێت. |
| بطباط - عصا الراعي | Polygonum | (پۆلیگۆنۆم) جۆرە ڕووەكێكی ساڵانەی تەمەن درێژە ئەكرێت بە نیوەنەمك گوڵەكەی بێ كاسەو سپی یان پەمبەییە، قەدەكەی لقی زۆری لێ ئەبێتەوە، لقەكانی ڕاكشاون لەسەر زەوی. |
| بطح | Supination | ڕاخستن، پاڵخستن. |
| بطحاء | Savana= steppe | زەوی بەربەڵان. |
| بطروميس | Pteromys | (پتێرۆمیس) گیاندارێكی شیردەری قرتێنەرە لە كۆمەڵەی سمۆرە. |
| بطريش | | جۆرە قالۆنچەیەكە تونێكلی قەدی ڕووەك كون ئەكات و زیانی پێ ئەگەیەنێت. |
| بطرشيل- بطرشين | Stole | دەسماڵ، چارۆكە، سركەیی. |
| بطرف العين | Twinkling of an eye | بەتیلایی چاو. |
| بطريق- اكتع | Penguin | (پەنگوین)، باڵندەیەكی ئاویی باڵ و لاق كورتە توانای فڕینی نییە، لە ناوچە پۆڵییە بەستووەكاندا ئەژی، پێستێك وا لە نێوانی پەنجەكانی دا، پشتی ڕەشە و سكی سپییە. |
| بطرخ | Fish roe | (ڕۆی) گەرای ماسی، كافیار لە ماسی سترجیون دەرئەهێنرێ. |
| بطريخ - حفش | Sturgeon | (سترجیون) سووره ماسی، ماسییەكی ڕووباریی سەربچووكی ناوقەد پانە، كافیاری لی دەرئەهێنرێت. |
| بطس | | جۆرە ماسییەكە لە تاریكیدا ڕووناكی ئەداتەوە. |
| بطل | Glass vessel | قاپ، قاپی شووشە. |
| بطل | Hero | قارەمان، پاڵەوان. |
| بطل متبجح | Atlaunt hero | فسفس پاڵەوان. |
| بطلان | False hood | درۆ، ووتەیەكی ناڕاست. |
| بطلينوس | Limpet | (لیمپێت)، جۆرە گیاندارێكی نەرمی سەدەفدارە بە بەردی قەراغ دەریاوە ئەنووسێت، جۆرێكە لە گوێچكە ماسی. |

| | | |
|---|---|---|
| بطم- ضراوة- قريشقه- حبة خضرة- برزق | Terebinth | (تەربینث) دارەبەن، دارقەزوان، وەن، بەن، قەزوانی دەنك گەورە، درەختێكە لە درەختی بستە ئەچێ گەلایەكی بچووكی هەیە، مادەی تەربەنتینی بنێشتی لێ دەرئەهێنرێت و بۆ مەبەستی پزیشكی و پیشەسازی بەكاردێت. |
| بطم شرقي- بطم مستكي- مصطكاء | Lentisk=Mastic | (لینتیسك) قەزوانی مەستەكی، مەستەكی، جۆرێكە لە دار قەزوان. |
| بطن | Abdomen | (ئەبدۆمێن) سك، زك، زگ، وورگ، لەمە. |
| بطنية القدم | Gastropoda | پی سكی، جۆرە گیاندارێكی دەریایی نەرمە، پێی بە سكی‌یەوە نووساوە، وەكو شەیتانۆكە. |
| بطنج، فلية | Pennyroyal | پونگە، گیایەكی بۆن خۆشە لە نەعنا ئەچێ، بەلام قەراغی گوڵەكانی سافە، گوڵەكەی شینی مەیلەو بنەوشەیی‌یە، لەگەڵ خواردنا ئەخورێت یان ئارەقەكەی ئەگیرێت بۆ دەرمان، بۆدینە، پنگ. |
| بطولة | Heroism | پاڵەوانی، پاڵەوانێتی، جوامێری، ئازایەتی. |
| بطء | Delay | هێواش، لەسەرخۆ، بەشێنەیی، سستی. |
| بطيء | Slow | لەسەرخۆ، هێواش، خاو، خلیچك، سست. |
| بطيخ | Melon | (میلۆن) گندۆرە، كاڵەك، جەبەش. |
| بطيخ مر | Bitter melon | تاڵك، تەحلك، كاڵەكی زرك. |
| بطيخ حرش | Melon | كاڵەك. |
| بطيخ محزز | | كاڵەكی قاش قاش، گەرمەك، كاڵەكی كووز كووز. |
| بطيخ شوكي- مقلة القاضي | Melon thistle | (میلۆن ثیستل) جۆرە ڕووەكێكە بۆ ئارەق كردنەوەو نەخۆشی فەرمنگی بەكارئەهێنرێت. |
| بطيط | | (كرینیدینس) جۆرە ماسی‌یەكە. |
| بطين | Ventricle | زگۆڵە. |
| بطين ايمن | Right ventricle | زگۆڵەی ڕاست. |
| بطين ايسر | Left ventricle | زگۆڵەی چەپ. |
| بطيمة | Jungle | بێشە، جەنگەڵ. |
| بظر- بظار- كينة | Clitoris | (كلیتۆریا) "قیتكە" بەلۆكە، میتكە، چیچكە، چیلك زیلك گلك بەشێكە لە قوز |
| بظ- بظيظ | Corpulent = fat | قەڵەو. |
| بعامة- بعام- بعيمة- شمبانزي | Chimpanzee | (شەمپانزی)، مەیموونێكی ئەفریقی زیرەكە لە مرۆڤ ئەچێت. |
| بعاق | Rainyclowd | هەوری باراناوی. |
| بعبع | Bugabo = bugbeer | خێو. دێو، سەرچاوەی ترس. |
| بعبع | Wild cat | گون ڕەش، سیاگوش، سیولۆ، جۆرێكە لە پشیلە كێوی تۆپەڵێك موو وا بەسەر گوێیەوە. |
| بعبعة | Babbling | باقە باق. |
| بعثة | Mission | نێراو، كۆمەڵە مرۆڤێكن بەفرمانێك دەنێردرێن بۆ شوێنێكی تر. |
| بعثة النائم- سرنمة | Sum nam bolism | ڕۆیشتن بەدەم خەوەوە، بەدەم خەوەوە ڕۆیشتن. |
| بعجة | Adent | قوپاوی. |
| بعد | Farness | دووری. |
| بعد الظهر | Afternoon | پاش نیوەڕۆ. |

| | | |
|---|---|---|
| بعد النظر | Farsighted | ووردبینی، دووربینی، درێژبینی. |
| بعد بؤری | Focus | بیلبیله دووره، دووری سەرچاوەیی، دووری سەرچاوە. |
| بعر- بعرور | Dung | (دیچیکش) پشقل، قشپل، پشکول، حۆله. |
| بعض | Some | هەند. |
| بعقة- هامة- ام الصخر | Eagle owl | (ئیگڵ ئوڵ) جۆرێکە لە کوندە بەبووی سپی و هێڵی ڕەشی تیایە. |
| بعل | Husband | مێرد. |
| بعلة | Married woman | ژنی مێرددار. |
| بعنق | Great falcon | (هارپی) جۆرێکە لە هەڵۆو گەورەیە. |
| بعوض | Mosquito | (مۆسکیتۆ) پێشو، کەرمێش، مرمرك، مێشوولە، پێشکە، پەخشە، خاکە، پێشوولە. |
| بعوضة كبيرة | Great mosquito | هۆڕە، تەپۆ، مێشوولەی گەورە. |
| بعوض إيدس | | مێشوولەی ئیدس. |
| بعوض الحمى الصفراء | Yellow fever | مێشوولەی زەردەتا. |
| بعيثران | Santo lina | (سانتولین) لۆکەی لاوەنتە. |
| بعيثران | Wild basil | ڕیحانە کێویلە. |
| بعيد | Distant=Far | دوور، دوێر. |
| بعيد النظر- بعيد البصر | | دووربین. |
| بعير | Camel | (کامیل) ووشتر، ووشتری نێر. |
| بغ | Camel | بەچکە ووشتر. |
| بغاء | Adultery | قەحبەیی، حیزی. |
| بغال | Muleteer | قەتارچی، ئێسترەوان. |
| بغاث | Vulture | (ئوڵچەر) کەرگەس، لاشەخۆر، داڵی کەرخۆر، پیرۆزە، کەرخۆرە، جۆرێکە لە سیسارکە کەچەڵە. |
| بفت- بفتة | Calico | (کالیکۆ)، خام، چنراوێکی سادەی مەیلەو بۆری هەرزانە. |
| بفتة | Suddenly | کتوپڕ، ناکاو. |
| بفر | Downpour | (داون پاوەر) شەستە باران. |
| بفشة | Shower | (شاوەر) نمە باران. |
| بغل | Mule | (میول) ئێستر، هێستر، قاتر، گیاندارێکی دووڕەگە لە کەرو ماین. |
| بغنونية | Bignonia | (بیگنونیا) دارو دەوەنێکە گوڵی جوان ئەگرێت. |
| بفلو | Buffalo | (بەفەلۆ) گامێشی ئەمەریکا، گامێشی هیندی. |
| بفن | Puffin | (پەفەن) باڵندەیەکی دەریایی باکووری دەنووك کەل ڕەنگاو ڕەنگە. |
| بق | Mouth | دەم. |
| بق | Bug | (بەگ) مێشوولەی وورد، ئاخۆرە، تەپۆ، هورە، توفانە، جۆرێکە لە مێشوولە کە هەندێکی نەخۆشی تیفوس (ڕەشە گرانەتا) بڵاوئەکاتەوە، گاورك، پێشکە، مرمرك. |
| بق الست | Red bug | جۆرە مێشوولەیەکی سوورە. |
| بق | | (الأیم) ڕوومەکێکە بەرمەکەی باڵی هەیە. |
| بقاء | Staying | مان، مانەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| بقاء الاصلح- بقاء الأنسب | Surviual of the fittest | مانى چاكتر، مانەوەى چاكتر، مانەوەى باشتر، مانەوەى ئەو زيندەوەرەى كە باشتر لەگەڵ سروشتدا خۆى ئەگونجێنێت. |
| بقايا | Remainder | پاشماوە، بەرماوە. |
| بقايا اثرية | Vestigo = Remains | پاشماوەى ديرين، ئاسەوارى كۆن. |
| بقايا العلف | Fodder remains | پاشا خور، پاش ئاخورە. |
| بقاط- حنظل | Colocynth | گوژاڵك. |
| بقايا الياف | Sediment=Dregs | تلپە. |
| بقاق | | (بەكۆ) جۆرە باڵندەيەكە بەسەر درەختدا هەڵئەگەرێت. |
| بقايا الاقمشة | Trash = rubish | سەرە مقەست، وورده والا. |
| بقال | Greengrocer | بەقال، سەوزە فرۆش، تەرە فرۆش. |
| بقان | Pecan | (پيكان)، گوێزى ئەمريكى، درەختێكە گەڵاكەى ئەوەرێت بۆ رازاندنـەوەو سێبەر بەكارئەهێنرێ وە بەرەكەى لە گوێز ئەچێت، بەلام توێكڵەكەى تەنكە نزيكەى (٦٠) مەتر بەرز ئەبێتەوە. |
| بقبقة | To buble | فلقەفلق، فلق و هووپ. |
| بقة- بق | Bug | (بەگ) جۆرە مێشوولەيەكى بۆگەنى رەش يان سوورە. |
| بقة خضراء | Green bug | مێش و مەگەزێكى سەوزى زيان بەخشە لەسەر سەوزەوات و لۆكە ئەژى. |
| بقة الزرع- سونة | Aphid = eurygaster | (يوريگاستەر) سن، مێروويەكى زيانبەخشە بە دەغڵودان. |
| بقة اللك | Lac bug | (كۆكەس-لاكا) مێشوولەى لۆك، مێروويەكى قاوەييە قەدو لقى رووەكى لۆك بريندار ئەكات و ئاوكە زەمقىيەكەى ئەكات بە لۆكێكى لينجى چاك. |
| بق دقيقي | Mealy bug | (ميلـى بـەگ) مێشوولەى رووەك، تۆفانـە، كيسـەڵە، مێروويەكـە نەخۆشـى رووەك بلاو ئەكاتەوە. |
| بقدونس- مقدونس- كرفس رومي | Parsley | (پارسـيلى، پيترۆسـيلينوم) مـەعدەنووس. جەحفەرى، زوورك، رووەكێكـە گوڵەكەى وەك چەتر وايە تامى گەڵاكەى خۆشە، چەورىى كافوورى تيايە، بەشێوەى بەهارات بەكارئەهێنرێت. |
| بقدونس بري | Cow weed | (كاووید) مەعدەنووسە كێويلە. |
| بقر | cut through | هەڵ دڕين. |
| بقر- بقرة | Cow | (كاو) مانگا، چێڵ، چێڵ. |
| بقر حلوب | Milker cow | مانگاى فرەشير، مانگاى بەشير، مانگاى شيردەر. |
| بقر وحشي- مهاة | Wild cow= Oryx | مانگاى كێوى، مانگا كێوىى سپى. |
| بقر هندي | Indian cow | مانگاى هيندى، جۆرە مانگايەكى گەورەيە دوگێك وا بەپشت ملىيەوە. |
| بقر البحر- فقمة- عجل البحر | Seal | (سييل) مانگاى دەريايى، گياندارێكى شيردەرى ئاوييـە بەشـى پشـتەوەى (خوارەوەى) لەشـى لـە ماسـى ئـەچێت، دوو دەسـتى هەيـە، قـاچى نىيـە، گۆشتەكەى ئەخورێت، گوێرەكەى دەريا. |
| بقر الماء | Sea cow | مانگاى ئاوى، جۆرە نەهەنگێكە لە مانگا ئەچێت. |
| بقري | Peccary | (پيكاريس)، گياندارێكە لە بەراز ئەچێت، بچووك و گياخۆرە. |
| بقرور | Poisonedfrog | جۆرە بۆقێكى ژەهراوييە. |
| بقس- شمشاد- شمشير- عثق | Box wood | (بوكس وود) شمشاد، درەختێكە گەڵاكانى هێلكەييە، بۆ رازاندنەوە لـە باخچەكاندا بەكارئەهێنرێت، تەختەكەى رەق و بە نرخە. |

| | | |
|---|---|---|
| بقسماط | Rusks | بەكسەم، بەقسەم، جۆرێكە لە چۆرەك. |
| بقشة | Sealed bag | بوخچە. |
| بقشيش | Present | مزگێنی، بەخشیش. |
| بقطر | | گیا دووپشكە، دۆبەسەرە، ڕووەكێكی پزیشكی تاڵە بەهێزكەرو وورياكەرەوەيە بۆ لەش. |
| بقعة | Stain=Spot | پەڵە، پنكە، لەكە. |
| بقعة شمسية | Sun spot | پەڵەی ڕۆژ، پەڵەی خۆر، چەند پەڵەيەكی گەورەی مەيلەو ڕەشن لەسەر ڕووی خۆ ئەبينرێن، "سەن سپۆت". |
| بقعة عينية | Eye spot | (ئای سپۆت) پەڵە چاوە، چاوە پەڵە، پەڵەيەكی (خاڵێكی) پرتەقاڵیيە لە لەشی ڕووەكی كلاميدۆمۆناس دا. |
| بقلة = فول | Broad bean | پاقلە. گيايەكی ساڵانەی ناسراوە توێكڵی بەرەكەیو دەنكەكەی دەخورێت. |
| بقلة | Ling | (كۆد) جۆرە ماسیيەكە. |
| بقل- بقول | Legumes | سەوزەوات، هەموو جۆرە گيايەك كە مرۆڤ بيروێنێت بۆ مەبەستی خواردن. |
| بقلة | Rock ling | (ڕۆك لينگ) ماسیيەكی دەريايی سەرپانە. |
| بقلة الانصار- ملفوف | Cabbage | (كابێج) كەلەرم. |
| بقلة حمقاء- رجلة | Porslane | (پۆرسلين) پەڵپينە - گيايەكە لەناو باخەكاندا دەڕوێت دەكرێت بە چێشت. |
| بقلة الاوجاع | | (كەناديان هۆرمنيت) پاقلەی ئێشوئازار، گيايەكی پزيشكی و نەشتەكیيە گەڵاكەی ئەخرێتە سەر دوومەڵ. |
| بقلة الامهات- فراسيون القلب | Common mother wort | (كۆمۆن مەذەر وۆرت)، پونگە، ڕێحانە كێويلە، جۆرە گيايەكە بۆ دامركانەوەی دەمار و كرژبوون و كولنج باشە. |
| بقلة خضراء | Vege tables | (فيجيتێبڵ) سەوزە، سەوزەوات، هەموو گيايەك كە مرۆڤ بی خوات، پاقلەمەنی، تەرە. |
| بقلة القدس | Penny royal | پونگە - گيايەكە لە نەعنا دەچێت. |
| بقلة الخطاف | Celandine | سيلاندين، گيا پەرەسێلكە. گيايەكی پزيشكیيە. |
| بقل السلطة | | جۆرە سەوزەيەكە لە قرنابيط ئەچێت. |
| بقلة العطاس- اخيليا | Sneeze weed | (سنيزری وۆرت)پاقلەی پشمين، پاقلەی پژمين. |
| بقليات | Leg vmes | پاقلە چەشن، پاقلەمەنی، پاقلەو نيسك و نۆك. |
| بقلة الملك | Fumitory | (فەميتورس)، شاتەرە، گيايەكە گەڵاكەی خۆڵەمێشیيە، گوڵەكەی بە شێوەی هێشوويەكی سوورەگرێی ڕەشی تيايە بۆ نەخۆشی پێست بەكاردێت. |
| بقلة الماء | White hellebore Water cress | كووزەڵە. |
| بقلة الرماح- خربق ابيض | Veratrum album | خەرپونگی سپی - گيايەكی پزيشكیيە. |
| بقلة الخطاطيف- عروق الصباغين | Greater celandine | (كريتەر سيلاندين)، زەردە چەوە، ڕەوان كەرە، بۆ نەخۆشی كۆكە ڕەشە و سەرما باشە، پاقلەی پەرەسێلكە، ڕەگی ڕەنگ كردن. |
| بقلة الصماليك | Clematis | (كليماتيس)، ياسەمەنە كێويلە، ڕووەكێكە لە ڕەگەزی گوڵاڵە سوورە، توونو ژەهرە، هەندێكی بۆ ئارەق كردنەوەو ميزكردن بەكاردێت. |
| بقلة الرئيس- بقلة الامبراطور | Master wort | (ماسترۆرث) پاقلەی سەرۆك - خەرپونگی ڕەش. |
| بقلة اللبن | Cheese-Rennet | (چيزرينيت) بەناشوانە، نانە شوانە، جۆرە گيايەكی بۆن خۆشە ئەكرێتە ناو ماست. |

| | | |
|---|---|---|
| بقلة الغزال- ريحان الارض | Dittany | (ديتانى ئوف كريْت) پاقلەى ئاسك، ريحانەى زەوى. |
| بقليو | | جۆرە ماسىيەكە لە نەمەنگ ئەچيْت، ووشك ئەكريْتەوە يان رۆن ماسىى لىْ دەرئەهيْنريْت. |
| بقلة مباركة- هندباء | Endive | تاليشە، گيايەكى تاڵە گەڵاكەى ددانداره. |
| بقلة يهودية- تفاف | Milk Thistle | (ميلك ثيستل) پاقلە جوولەكانە. |
| بقلاوة | Pastry | پاقلاوە. |
| بقم- جوزماثل | Downy Thorn apple | (ميتيل، دۆونى ثورن ئەپل) جۆريْكە لە تاتورە لە كۆمەڵەى باينجان، دەوەنيْكى پزيشكىيە ژەهر نىيە. |
| بقم | Logwood = campeachy | (لۆگ وود)، بەقەم، رەنگيْكى سوورە، درەختى ئاژليها، خويْنى دوو براكە، تەختەى سوور، درەختيْكە گەڵاكەى لە گەڵاى بادەم ئەچيْت قەدەكەى سوورە. تەختەكەى بەنرخە، رەنگى لىْ دەرئەهيْنريْت. |
| بقويقة- ليموزية | Godwit | (گۆدويت) باڵندەيەكى قەراغ ئاوە لە كاروانە وئاتا كەرەوڵە ئەچيْت. |
| بقونية | Bocconia | (بوكونيا) رووەكيْكى پزيشكىيە. |
| بقية | Rest | پاشماوە، پاشەرۆك. |
| بكاء | Weeping | گريان، شين، واوەيلا، زارى، زووره. |
| بكاسين- شنقب | Snipe | (سنايپ) قورلويلە، قورلويلكە، باڵندەيەكى دەنووك تيژە بەڵەدەر سويسكەيەك ئەبيْت. |
| بكالوريا | Bacaloureate | (بەكەلۆريت) بڕوانامەيەكە دەرچوانى پلەكانى خويْندن وەرى ئەگرن، بەكەلۆرى. |
| بكالوريوس | Graduate | (باكيلۆر)، بڕوانامەيەكى بەرزە، دواى پلەى ئامادەيى ئەدريْت لە ماجستيْرو دوكتورا نزم ترە، بەكەلۆريۆس. |
| بكالوريوس علوم | Bachelor of Science | بڕوانامەى بەكەلۆريوس لە زانستەكاندا. |
| بكالوريوس فنون | Bachelor of Arts | بڕوانامەى بەكەلۆريوس لە هونەر يان ئەدەبدا. |
| بكارة | Virginity | (ڤيرجينيتى) بن، كچيْنى، كەنيشكى، پەردەى كچيْنى. |
| بكارة | | (فۆرسينگ – هاوس) ژوورى شووشە بۆ پەروەردە كردنى رووەك. |
| بكتريولوجيا | Bacteriology | (باكتريۆلۆجى)، ميكرۆب شوناسى، ميكرۆب زانى، زانستى باكتريا، زانيارى ميكرۆب. |
| بكتريا | Bacteria | (باكتريا)، زيندەوەريْكى رووەكىيە لەشى تەنها لە يەك خانە پيْكهاتووە، بەچاو نابينرىْ، مادەى سەوز "كلۆرۆفيل"ى تيا نىيە، بەريْگەى دابەش بوون زۆر ئەبىْ، هەنديْكىْ بەكەڵكەو هەنديْكى زيان بەخشە، نەخۆشى درم بڵاو ئەكاتەوە. |
| بكتريا هوائية | Aerobic bacteria | باكترياى هەوايى، ئەو جۆرە باكترياييە كە ژيانى لەسەر ئۆكسجين وەستاوە. |
| بكتريا لا هوائية | Anerobic bacteria | ئەو جۆرە باكترياييە كە ژيانى لەسەر ئۆكسجين نەوەستاوە. |
| بكتين | Pectin | (پەكتين) مادەيەكى رووەكىى لينجە لەگەڵ كالسيۆم دا يەكى گرتووە، لە رەگ و تويْكڵ و گەڵادا هەيە. |
| بكتريا الازوت | Azobacter | (ئازۆتوباكتر) باكترياى ئازۆت، كە ئازۆتى زەوى ئەكات بە مادەى بەكەڵك بۆ رووەكى پاقلە چەشن. |
| بكر | Vergin | كچ، كەنيشك. |
| بكر | First born | نۆبەرە، بەرەزا، نەخرى. |

| | | |
|---|---|---|
| بكرة | Pully | (پولـی) خلۆکە، خول خولۆکە، بەکرە، خلـۆك، خرخـرە، بەکـەرە، بـەکرەی دەزوو، ئامرازێکی لوولەیی‌یە ناوەراستەکەی چاڵە پەتێکی بەسەردا تێپەر ئەکرێ بۆ بەرزکردنەوەی شتومەکی قورس. |
| بكرة القطن | Reel | (ریل) تەختە کنگر. |
| بكسا- شجرة صبغة الارناتو | | (ئەرناتۆ) دەوەنێکی دەشتەکی‌یە گوڵێکی زەرد ئەگرێت، بەرەکەی تووکنەو رەنگی سووری لێ دەرئەهێنن. |
| بكف- توفة- حبة القلب فوانيس- ظرو اسود | Heart pea | (هێرت پیا) قەزوانی رەش، دەنکی دڵ، رووەکێکە گوڵەکەی سپی‌یە دەنکەکەی بەقەدەر نۆکێك ئەبێ رەش و رەقەملوانکەی لێ دروست ئەکرێت. |
| بكلة | Bucklet | قۆپچەی نێرومێ، دوگمەی نێرومێ، تەرەقە. |
| بكم | Dumb found | کەم و کووری یان نەتوانین. |
| بكمة | Muteness | لاڵی. |
| بكورة | | (پیلامایدس) جۆرە ماسی‌یەکە. |
| بكر- باكور | First rian | بارانی پەڵە. |
| بكرة | First flower | (هیفەر) سەرگوڵ، نۆبەرە، نوخشە. |
| بلاهة- بلادة | Idiocy | گێژی، گەمژەلی، دەبەنگی، گەلحۆیی، حۆلی. |
| بلاعة- بلوعة | Sink | ئاوەرۆ، گونجی ئاوی پیس. |
| بلاغ | Informatoin | راگەیاندن. |
| بلاطة- بلاط | Tile = Flagstone | تەلەبەرد، خشت، خشتی کاشی، کێل، تاشەبەرد، بەردی ناوفەرش، بەردی بەردە رێژ. |
| بلانة | Poterium = spinosum | رووەکێکی درکاوی‌یە، گەڵاکانی وردە، بەرەکەی خرو رەشە زیان ئەدات بە کشتوکاڵ. |
| بلاط | Royal Palace | کۆشك. |
| بلاذر- انقردية- جوزة كاشو | Anacardium= Casheow | (ئەناگاردیەم) درەختێکە لە کۆمەڵەی قەزوان تەختەکەی سـوورە مەیلەو قاوەیی‌یە، بەنرخە، کەلوپەلی تەختەی لـێ دروست ئـەکرێت، هـەروەها لـە قەدەکەی زەمقی ئەکاجو (کاشو) دەرئەهێنرێت. |
| بلاستيك | Plastic | (پلاستیك)، هەر جۆرە مادەیەکی کیمیایی کە دابرێژرێت لە دارێگەدا بـە زەبری پاڵە پەستۆو گەرمی بۆ دروست کردنی شتومەك، جۆرێکی بە گەرم کردن نەرم ئەبێ و جۆرێکی تری رەق ئەبێ، هەشـە توانـای کـرژ بـوون و کشانی هەیە، بۆ گەلێ مەبەستیش بەکارئەهێنرێ وەکو دروست کردنـی پارچەی فڕۆکە. |
| بلازما | Plasma | (پلازما)، زەرداوی خوێن، شـلاوی خوێـن کـە خڕۆکـە سـوورو سـپی‌یەکانی تیایە. |
| بلاسموديوم | Plasmodium | (پلاسمۆدیۆم) میکرۆبی مەلاریا. |
| بلايستوسين | Pleistocene | (پلایستۆسین)، دوا سەردەمە جیۆلۆجی‌یەکانە (ملیۆنێك ساڵ لەمەوبەر) مرۆڤی کۆنی تیا هاتۆتە سەرزەمین. |
| بلاستيدة | Plastid | (پلاستید)، تەنێکی بچووکە لە خانەی رووەکدا رەنگی تیایە. |
| بلاستيدة خضراء | Green plastid | پلاستیدی سەوز. |
| بلاستيدة ملونة | Coloured plastia | پلاستیدی رەنگاو رەنگ. |
| بلاستيدة عديمة اللون | Uncoloured plastia | پلاستیدی بێ رەنگ. |

| | | |
|---|---|---|
| بلاستيدة بيضاء | White plastia | پلاستیدی سپی. |
| بلاستيسين | Plasticine | (پلاستیسین)، قوڕی دەستکرد. |
| بلاستولا | Blastula | هەنگاوێکە لە هەنگاوەکانی گەورەبوونی ئاولەمە واتە بێچوو لە منالّدانا، تورەکەی ئاولەمە، تورەکەی پیس. |
| بلاناريا | Planarian | (بلاناریا)، جۆرە کرمێکە، لەگەڵا دەچێت. |
| بلاتبوس - منقار البطّ | Platypus | (بلاتبوس)، دەنووکی مراوی، گیاندارێکی ئاوی یە، شیردەری هێلکەکەرە لە ئوسترالیا ئەژی. |
| بلاديوم Pd | Palladium | (پالادیۆم)، توخمێکـی کیمیاگەرییـە، کێشـی ئەتۆمی‌یەکـەی (١٠٦/٧)و ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٤٦)ە ماناکەی لە ووشەی (پالاس) واتا خوداوەندی ژیری (الهة الحکمة) وەرگیراوە. |
| بلاغ | Report | راپۆرت. |
| بلاكرا- بلاجرا- داء الذرة | Pellagra | (پلاگرا)، نەخۆشی‌یەکە بە زۆری تووشی جوتیار ئەبێ، نەخۆشی پێست و بشێوی دەمارەکانە لە کەمی ڤیتامین B ئەبێ، سەودای پێست. |
| بلاتين Pt | Platinum | (پلاتین) توخمێکـی کیمیاگەرییـە کێشـی ئەتۆمی‌یەکـەی (١٩٥)و ژمـارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٧٨)ە کانزایەکی سپی‌ی زیوییە ماناکـەی (پلاتینـا) واتـا (نیمچە زیو) ئەگرێتەوە، بۆ دروستکردنی بۆتەو دارشتەو خشل بەکاردێت. |
| بلادونا - ست الحسن | Belladonna | (بیلادونا، نایت شید، بیتـەر سوێت، فۆکس گلۆف) ڕووەکێکی ساڵانەیە، رەزلـە، توولـەزەرە، مـادەی (ئـەترۆپین، بلادونـین) لـە ڕەگ و گـەڵاکانی دەرئەهێنرێ، بۆ ووریاکردنـەوەی دڵ و هەناسـەدان، هـەروەها بۆ سـڕکردن بەکارئەهێنرێ، بەرەکەی وورد و سوورە لە شێوەی هێشوودایە. |
| بلاك | Plug | (پلاك)، ئامرازێکی کارەبایە دووسەری هەیە ئەکرێت بەسوکێتەکەدا. |
| بلانيميتر | Planimeter | (بلانیمەتر) دەزگایەکە بەکارئەهێنرێ بۆ دۆزینەوەی ڕووەکان لە ئەخشەوە، بە تایبەتی لەو ڕووانەی کە شێوەیەکی نارێکیان هەیە. |
| بلاطة | | زەقنەمووت، ژەقنە مووت، درەختێکی ناوچە گەرمەکانە بەرەکەی ژەهرە. |
| بلاغة | Eloquence | زمان ڕانی، زمان ڕەوانی. |
| بلاكوديرم | | (پلاکۆدێرم) جۆرە ماسیەیەکی سەرەتایی قر تێکەوتووە. |
| بليسوسور | Plesiosaur | بلیسۆسۆ گیاندارێکی خشۆکی قرتێ کەوتووە. |
| بلانيرة | Planer tree | (پلینەرتری) دارو دەوەنێکە گەڵاکەی هێلکەیی‌یەو بەرەکەی باڵدارە. |
| بلانيرة مائية | Planton | (والارین) سوورەچنار. |
| بلان- كزبرة الثعلب | Fools parsley | (بۆتیریۆم) گژنیژەی ڕێوی، گیایەکە بۆ لەوەرو مەبەستی پزیشکی باشە. |
| بلاوة | | درەختێکی هەمیشە سەوزە لە وولاتی شیلی ئەروێ، دەرمانێك لە ڕەگو گەڵاکەی دەرئەهێنرێت بۆ چارەکردنی خوێن کەمی و بێ هێزی. |
| بلارج- بلرج | White stork | (وایت ستۆرك) لەقلەق، حاجی لەقلەقی سپی. |
| بلامباغو- بلامباجو | Plumbago | ڕووەکێکی ناوچە گەرمەکانە گوڵی جوان دەگرێت. |
| بلانكتون | Plankton | (پلانکتۆن) گیاندارێکی یان ڕووەکێکی میکرۆسکۆبی‌یە سەر ئاو ئەکەوێت. |
| بلانتريوم- السينما الفلكية | Planetarium | (پلانیتـاریۆم) دەزگایەکـە جوولـەوەی خـۆر و مـانگ و ئەسـتێرە گەرۆکـەکان نیشان ئەدات بە ئاراستەکردنی ڕووناکی لە ژوورێکی گومەزی داردا. |
| بلبل- كعيت- نعز | Bulbul | (بولبول) بولبول، باڵندەیەکی دەنگ خۆشە. |
| بلبل الأبريق | Nozzle | لوولەی مەسینە. |

| | | |
|---|---|---|
| بلبل الشعير- ارطلان | Ortolan | (ئورتۆلان)، بولبولی جۆخۆر، جۆ خۆرە، زەردەوەلی، باڵندەیەکی زەردی جۆ خۆرە، بولبولی جۆ. |
| بلبال- ذئب | Wolf | (وولف) گورگ. |
| بلبوس- حلحل | Muscari | (مەسکاری) گیایەکی سەلکداری کشتوکاڵییە. |
| بلبول | Pintail | (پینتێل) مراویی کلك درێژ، جۆرە مراوییەکی هەمە ڕەنگە. |
| بلجة | To dawn | سەرەتای بەرەبەیان. |
| بلح | Dates | فەریکە خورما. |
| بلح - كاسر العظام | Lammergeyer | (لامیر جیەر) (جیپایتوس) ئێسك شکێن، "هوما" داڵەکەر خۆرە باڵندەیەکە لە سیسارکە کەچەڵە ئەچێ ڕەنگەکەی بۆرەو بەرخ و کەروێشك ئەخوات بە فڕاندنیان بۆ ئاسمان و بەردانەوەیان. |
| بلح البحر | Mussel | (موسیل) جۆرە گیاندارێکی دەریاییە سەدەفی هەیە، جۆرێکە لە گوێچکە ماسی. |
| بلح الصين | Jujube | عەنەب. |
| بلح الصحراء - زقوم | Balanites aegyptica = zachumoll | هەلیلە. دەوەنێکە بەرەکەی دوای پێگەیشتن دەخورێت بەلام پێش پێگەیشتن ڕەوانکەرە. |
| بلخية | Silkvine | (سیلك فاین) مێوی ئاوریشم، دەوەنێکی خزەهەڵواسەرە گوڵەکەی سەوزەو بنەوشەییە بەرەکەی لوولەییو سافە. |
| بلدغ | Bulldog | (بۆلدۆك) سەگێکی گورجی سەرزل تووك کورتە. |
| بلدوزر | | مەکینەی تەخت کردنی زەوی. |
| بلدة | Town = city | شار، وولات، شارۆچکە. |
| بلدية | Pamanicipality | شارەوانی. |
| بلزا | Balsa | (بالسا) درەختێکی ناوچە گەرمەکانە تەختەکەی ڕەق و سوکە کەڵەکی لێ دروست ئەکرێت. |
| بلسان- بيلسان | Elder | (ئیلدەر) بەلەسان، ڕووەکێکی جوان و پزیشکییە گوڵێکی سپی بۆن خۆش ئەگرێت بە شێوەی هێشوو. |
| بلسم | Balsam | (بالسام، بالم) مادەیەکی چەوری بۆنخۆشی زەمقییە برینی پێ ئەپێچرێت یان دائەپۆشرێت، ئەنزەرووت، عەنزە ڕووت. |
| بلسم | Myroxylon | (مایروزیلون) درەختێکە لە قەدو لقەکانی مادەیەکی ریسینی لێ دەرئەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی. |
| بلسن- بلس | Lentils | (لینتیل) نیسك. |
| بلسيوسور | | (بەلسیۆسۆر) گیاندارێکی خشۆکی لە کیسەڵ چووی قڕتێکەوتووە. |
| بلسك- غاليون أبيض | White bedstra | (کاج وێید) ڕووەکێکی دەشتەکی و پزیشکییە. |
| بلسم بيرو | Balsam of peru | درەختێکە تووڕەکەی بچووکی پێوەیە - بەلسەمی پیرو مادەیەکە لە مەیانی پزیشکیدا بەکاردێت. |
| بلسم كندا | Balsam of canada | جۆرێکە لە مادەی تەربەنتین لە توێکڵی درەختی (شوکران) یان (تنوب) دەرئەهێنرێ. |
| بلسك- خطاف | Swallow | (سوالۆ) پەرەسێلکە، باڵندەیەکە. |
| بلسار | | (بلسار) جۆرە ئەستێرەیەکە تازە دۆزراوەتەوە، زۆر بچووکە بە ووچان تیشکی ڕووناکی بلاو ئەکاتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| بلسان- بشامة- طيب الريح | | (پالسام) درەختێکە لقەکەی بریتییە لە داری سیواك، دەنکەکەی بۆ مەبەستی دەرمان بەکاردێت. |
| بلشون- بلشوم- مالك الحزين- إبن الماء | Heron | (هیرۆن) شینە شاهۆ، شاهۆ، خەمخۆرە، باڵندەیەکە گەلێ ڕەنگی هەیە وەکو ئەرخەوانی و سپی و سەوز، مل و باڵ و قاچی درێژە لە نزیک ئاو ئەژی، ئەگەر ئاوەکە ووشك بکات ماتەمینی دای ئەگرێت. |
| بلشون ابيض | White heron | شاهۆی سپی. |
| بلشون جبار- سبيطر- ابوعيزار | Giant heron | (جاینت هیرۆن) شینە شاهۆی مەزن. |
| بلصور | Plesiosaur | (پلیسیۆسۆر) گیاندارێکی خشۆکی دەریایی قڕتێ کەوتووە. |
| بلطة | Axe | (ئاکس) تەشوێ، تەور. |
| بلطوش- سمورة | Squirrel | (سکویرڵ) سمۆرە. |
| بلطي- مشط | Bulti | (بولتی). جۆرە ماسییەکە. |
| ثوندفيش | Pond fish | جۆرە ماسییەکی ڕووبارییە. |
| بلع | Swallowing | قووتدان. |
| بلعوم | Gullet | (گەلیت، گیولیت) گەروو، بین، قورگ. |
| بلغم | Phlegm | (پلیگم) بەڵغەم. |
| بلق | Spotted | بەڵەکی. |
| بلقع | Barren land | زەوی ووشکانی. |
| بلكون | Balcony | (بالکۆنی) باڵکۆن. |
| بلق | Alabaster | (ئەلاباستەر) بەردێکی ڕوونە وەکوو شووشە. |
| بلقشة | Merganser | (مێرگانسەر) جۆرێکە لە مراوی. |
| بلكونيا | | (پەلەگۆنیا) ڕووەکێکی بێ هێزە و خشۆکە لقی باریکی لێ ئەبێتەوە گەڵاکانی ئەستوور و گۆشتنن، گوڵەکانی بەشێوەی هێشوون، ڕەنگی سپی و سوور و ئەرخەوانی و هەندێ جار زەردی هەیە. |
| بلل | To become wet | تەری، تەربوون. |
| بللورا- بلورا | Pleura | (پلیورا) پەردەی سی. |
| بلور صخري | Pebble | (پێبل) کریستاڵی بەردین. |
| بلم- انشوا | Anchovy | (ئەنچوڤی) جۆرە ماسییەکی بچووکە. |
| بلمباكو | | (بلمباکین) دەوەنێکی خۆهەڵواسەرە، گەڵاکانی لە کەوچك ئەچن، گوڵەکانی بەشێوەی هێشوون بە ڕەنگی شین، مادەیەکی ژەهری تیایە ئەڵێن (بلمباکین)، وەهەروەها ڕۆنی بلمباکۆی لێ دەرئەهێنرێ بۆ هەندێ مەبەستی پزیشکی، هەندێ جۆری گوڵی سپی ئەگرێت. |
| بلمة | Rut | (ڕەت) بەکەڵی، ئاوسانی ئەندامی مێینە لەبەر ئارەزووی جووت گرتن. |
| بلمرة | Polymerization | (پولیمەریزێشن)، کرداری یەك گرتنی چەند گەردێك لەیەك مادە بۆ دروستکردنی مادەیەکی تازە. |
| بلميدة | | (پالامیدا) ماسییەکی دەریایی مەیلەو شینە. |
| بلند | Blende | (زینك سولفاید)، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی کانزای زینك، ڕەنگێکی قاوەیی هەیە. |
| بلنون | Nut weevil | (نەت ویڤیل) قالۆنچەیەکی زیان بەخشە لەسەردارو درەخت ئەژی. |

| | | |
|---|---|---|
| بلهارزيا | Bilharizia | (بەلهارزیا)، نەخۆشیی میزی خوێناوی، میزی خوێناوی. |
| بلهارزيا المستقيم | Bilharzia of rectum | بەلهارزیای ڕیخۆڵەی ڕاست. |
| بلهارزيا المجاري البولية | Bilharzia of hadder | بەلهارزیای میزڵدان. |
| بلورانيات | Crystalloid | (کریستالۆید)، ئەو مادانەی کە لە ئاوا ئەتوێنرێنەوەو ئەشێت کە بکرێن بە کریستال. |
| بلورة | Crystal | (کریستال)، چلوورە، کلۆ، ئاوبەست، هەر مادەیەکی کیمیایی ڕەق کە شێوەیەکی ئەندازیاری هەبێت وەکوو کریستالی خوێ چێشت. |
| بلورة آيونية | Ionic crystal | کریستاڵی ئایۆنی. |
| بلورة جزيئية | Molecular crystal | کریستاڵی گەردیی، کریستاڵی مۆلیکیولی. |
| بلورة مائية | Hydrated crystal | کریستاڵی ئاودار. |
| بلورة لا مائية | Non hydrated crystal | کریستاڵی ووشک، بێ ئاو. |
| بلور صخري | Quartz | بەردی کوارتز، جۆرە کریستاڵێکە روون و بێ ڕەنگە. |
| بلوط | Oak | (ئۆک) سەق، بەلوو، داروول، کۆیەک، بەڕوو، درەختێکی گەورە و بەهێزو ئەستوورە، بەرەکەی ئەخورێ کلاوی بەڕوو پێی ئەووترێ "جەوت" مادەیەکی دەباغ کەرە. |
| بلوط الملك | Chest nut | (چێست نەت) کەستانە، شابەڕوو. |
| بلوط اسود | Balck oak | بەڕووی ڕەش. |
| بلوط الفلين- بلوط فليني | Cork oak | بەڕووی تەپەدۆر، جۆرێکی تایبەتی‌یە لە درەختی بەڕوو، هەمیشە سەوزە، نزیکەی (١٥) مەترە بەرز ئەبێتەوە، توێکڵەکەی توێ توێ ئەکرێت و ئەنێررێت بۆ کارگە بۆ ڕاست کردنەوەو شتن بەهەڵم، ئینجا پارچە پارچە ئەکرێت و پێی ئەووترێ تەپەدۆر. |
| بلوط الارض- فراسيون | Hore hound | (هۆری هاوند) بەڕووی زەوی، گیایەکی پزیشکی تاڵە. گەڵاکەی سپییە. |
| بلوط احمر | Red oak | بەڕووی سوور. |
| بلوط اخضر- سنديان اخضر | Green oak | (ئیلێکس) بەڕووی سەوز. |
| بلوط لبناني | Lebanese oak | دندار، سوورەدا. |
| بلوط العفص- بلوط عفص | Galls | مازوو، مازی، مازك. |
| بلوط المستنقعات | | (کازورینا)، کلکە ئەسپ، بەڕووی زەلکاوەکان - درەختێکە بۆ ڕازاندنەوەی سەر شەقامەکان. |
| بلوط الصباغ | Valonia | (ڤالۆنیا)، بەڕوو ڕەنگ کردن، جۆرێکە لە بەڕوو و قاوەیییە جەوتی کلاوەکەی بۆ دەباغ کردن بەکاردێت. |
| بلوتو | Pluto | (بلۆتۆ)، نۆهەم ئەستێرەی گەڕۆکە لە نزیکیا لە ڕۆژەوە، (٣٦٧٥) ملیۆن میل لە ڕۆژەوە دوورە، تیرەکەی ٣٦٠٠هەزار میلە سووڕەکەی بەدەوری ڕۆژا بە (٢٤٨) ساڵ تەواو ئەکات. |
| بلوتونيوم Pu | Plutonium | (بلۆتۆنیۆم) توخمێکی کیمیاگەرییە کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (٢٤٢)و ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٩٤)ە، کانزایەکی دەستکردە، ماناکەی لە ووشەی ئەستێرەی گەڕۆك (بلۆتۆ) وەرگیراوە، لە دروستکردنی بۆمبای ئەتۆمی‌دا بەکارئەهێنرێ. نیشانەکەی (Pu)ە. |
| بلورات الثلج | Snow crystals | کریستاڵی بەفر. |
| بلوري | Crystaline | کریستاڵی، چلوورەیی. |

| | | |
|---|---|---|
| بلوغ- بلوغ جنسي | Maturity | (ماچوریتی) بلووق بوون، پێگەیشتن، ١٢-١٦ ساڵ. |
| بلومارية- ياسمين هندي | Indian jasmine | (پاكۆدلتری، تیمپڵ-تری) داروەوەنێكە قەدەكەی نەرمەو گەڵاكەی لە كەوچك ئەچێت، گوڵەكەی سپی و بۆن خۆشە، ئاوێكی ژەهرین لە قەدەكەی دەرئەهێنرێت بۆ سووتاندنی بالووكە. |
| بليادرو | Billiards | (بلیاردس، بیلاردۆ)، یارییەكە بە دارێك و تۆپێك ئەكرێت لەسەر مێزێكی گەورە كە قوماشی سەوزی بەسەرانەدرێت. |
| بليغة- غليسين- وستارية | Kidney bean | (گلیسین، كیدنی بین، ویستاریا) رووەكێكی كەپەرییە بۆ مەبەستی رازاندنەوەی باخچەكان. |
| بليون | Billion | (بلیۆن) (١) ملیۆن ملیۆن لە ئینگلتەرە، (٢) هەزار ملیۆن لە ئەمریكا. |
| بليلة | | كزە. |
| بليج- بليلج- اهليج | Myrolalan | (مایرۆپالان)، جۆرە درەختێكی هیندییە لە زەیتوون ئەچێ، دەرمانی لێ دەرئەهێنرێ. |
| بليد | Dull= Stupid= Idiocy | گێل، پلەی زیرەكی لە ٨٠-٩٠٪ بەلام شێت، پلەی زیرەكی لە ٢٥ °-٠ °، كەودەن، دەبەنگ، حۆل، گێژ، كەمزە، گەوج، وور، گەلحۆ، هەریی. |
| بليني | | (بلینی) جۆرە ماسییەكی بێ پوولەكەیە لەشی بە مادەیەكی لینجی خلیسك داپۆشراوە. |
| بليثولوجيا | Palethnology | (پالیثنۆلۆجیا)، لقێكە لە زانستی رەگەز و رەچەڵەكی ئادەمیزاد، باسی مرۆڤی پێش مێژوو ئەكات. |
| بليوغرافيا | Paleography | (پالیۆگرافیا) خوێندنی نووسین و نەخشی كۆن. |
| بليوسين | Paleocene | (پالیوسین) سەردەمێكی جیۆلۆجییە. |
| بليستوسين | Peistocene | (پلیستۆسین) سەردەمێكی جیۆلۆجییە. |
| بمبكس | | درەختێكی گەورەیە لە ناوچە گەرمەكاندا ئەڕوێ دەرمانێكی لێ دەرئەهێنرێ بۆ مێزكردن. |
| بمجرد | No more than | تەنیا، هەرئەوەندە. |
| بمناسبة | By the occasionof | بەبۆنەی. |
| بن | Coffee | (كەفی) قاوە، رووەكی قاوە، دەوەنێكی ناوچەگەرمەكانە و هەمیشە سەوزەو گوڵەكەی سپییە، دەنكەكەی ئەبرژێنرێت و ئەهارێت و لە ئاوا ئەكوڵێنرێت بۆ خواردن. |
| بناء- بناية | Building | ساختمان- خانوو، كۆشك، گڵكار. |
| بناء | Builder | وەستای دیوارو خانوو، بەنا، وەستای خانوو كردن. |
| بناء | Building = constracting | دروست كردن، بنیات نان. |
| بنان | Finger-Tips | سەری پەنجە، پۆرتك. |
| بنانا | Banana | مۆز. |
| بنات العيد- دعسوقة | Lady bird | خاڵخاڵۆكە - قالۆنچەیەكی سووری پنكە پنكەیە. |
| بنات وردان - صرصور- بنت وردان | Cockroach | (بلاتید، كۆكرۆچ) سیسرك، مێرووییەكی بۆگەنە لە ناودەست و ئاوەڕۆدا ئەژی. |
| بنات أوبر- كماة- بنات الرعد | Truffle | (ترەفل) دومەڵان، جۆرێكی بچووكی كوڵكنە لە دومەڵان تامەكەی ناخۆشترە لە تامی شێلم ئەچێت. |
| بنات نعش الكبرى | Great bear | حەوتەوانە، حەوت ئەستێرەیە لایەنی پۆلی باكووری، حەوت برا، چارەگا، تەرم، ورچی گەورە. |

| | | |
|---|---|---|
| بنات نعش الصغرى | Little bear | ورچی پچکۆله. |
| بنبر- بنبار - مخيط - سبستن | Cordia vnyxa | درەختێکی نیمچە گەرمیە، گەڵاکانی ئەوەرێ و ناوەرێ، گوڵەکانی بەشێوەی هێشوون، بەرەکەی بەقەدەر گوێزێك ئەبێت، ناوکێکی لینجی تیایە، بەرەکەی ئەکرێتە ترشیاتەوە، لە ناوچەی خوارووی عیراق ئەڕوێت، وە تەختەکەی هەندێ شتومەکی باش و بەکەڵکی لێ دروست ئەکرێت، توێکڵەکەی گوشی لێ دروست ئەکرێت. |
| بنت | Daughter | کچ، کیژ، کەنیشك، کناچە، دۆتە. |
| بنت الماء- حورية الماء | Mermaid | (مێرمێد) بووکی دەریا، گیاندارێکی ئەفسانەیە سەری لە سەری ئافرەت دەچێت و کلکی لە کلکی ماسی. |
| بنتان | Pentane | (پینتان)، مادەیەکی هایدرۆکاربۆنییە پێنج ئەتۆم کاربۆنی تیایە. |
| بنت القنصل- عنجد | Euphorbia | (یوفوربیا، ئیستەر فلەوەر)، شیرمار، دەوەنێکی بچکۆلەیە شیراوێکی تیایە سێ مەتر بەرز ئەبێتەوە، گەڵاکانی لاکێشەیی و سەوزن، وە قەراغەکانیان گرنج گرنجن، بەڵام گەڵای گوڵەکانی سوورن. |
| بنت النوخذة | | جۆرە ماسییەکە. |
| بنتوغراف - منساخ | Pantograph | (پانتوگراف)، مناخ دەزگایەکە بۆ ڕەنووس کردنی نووسین و وێنە. |
| بنج- سم الدجاج- سيكران- سكران | Henbane | ١- (هایوسیاموس، هێن بین) سڕکەر، بەنگ، دەرمانی بێ هۆش کردن یا سڕکردن، شلەیەکی سەرخۆشکەرە لە گەڵای ڕووەکی گوشی هێندی دەرئەهێنرێ و شیلەی راتنجییەکەی پێی ئەوترێ حەشیشە.<br>٢- ڕووەکێکی دەشتەکیی سڕکەرە لە کۆمەڵەی باینجان گوڵەکەی گەورەیە و گەلاکەی گەورەو لینجە، گوڵەکەی سپی یا زەرد یان بنەوشەییە دەنکەکەی پانەو مادەیەکی سڕکەری لێ دەرئەهێنرێت. |
| بنجر- شوندر | Beet root | (بیت رووت) چەنەوەر، چەوەنەر. |
| بنجوان- بينزوين | Benzoin | (بینزوین، بینجوین) دەوەنێکە بەرەکەی هێلکەیی و گۆشتنە و سوورە، تەختەکەی بۆن خۆشە و زەمقی لێ دەرئەهێنرێت. |
| بنجر السكر | Sugarcane | چەوەنەری شەکر. |
| بنجنكشت - حب الفقد | Agnus cactus | پێنج ئەنگوست دەوەنێکە بۆ رازاندنەوە بەکاردێت، دەڵێن ئەگەر دەنکەکەی بخورێت دەبێتە هۆی وەجاخ کوێری. |
| بندة- باندا | Panda | (پاندا)، گیاندارێکی شیردەری کەتمیە لە وورچ ئەچێت لە وڵاتی تیبت ئەژی. |
| بند | Section = term | بەند، بەش. |
| بندق- بندقة- جلوز- قارح | Hazel | (کۆریلەس، هازڵ) فنق، فندق، درەختێکی ناوچە فێنکەکانە بەرێکی رەقی خڕی خۆشی هەیە رۆنی لێ دەرئەهێنرێت. |
| بندقية | Gun | (گەن) تفەنگ. |
| بندقية رشاشة | Shot gun | شەستتیر، رەشاش، گوللەپرژێن، تفەنگی گولله پرژێن. |
| بندقية الصيد | Shot-gun | تاپڕ، تفەنگی ڕاو. |
| بندقية يدوية | Airgum | تفەنگی حوسکە، ساچمە زەن، جۆرە تفەنگێکە بەدەست دروست بکرێت. |
| بندقوط | Bandicoot | (باندیکوت)، مشکێکی گەورەیە لە هیندستان ئەژی. |
| بندير | Tram bourine | دەمۆڵی گەورە. |
| بندورة- طماطم- قوطة | Tomato | (تۆماتۆس) تەماتە. |

| | | |
|---|---|---|
| بندول | Pendulum | (پیندۆلیۆم) رەقاس، پانتۆل، پاندۆر. |
| بندول الساعة | Hain spring | پانتۆری سەعات، پانتۆلی سەعات. |
| بنديرة | Pennon | دروشم، یافتە، بەیاخێك نووسینی لەسەر بێت. |
| بنزين | Benzine | (بەنزاین)، ڕۆنێکی کانزاییە زوو ئەبێت بە هەڵم، زوو ئەسووتێت، لەنەوت دەرئەهێنرێ بۆ سووتەمەنی فڕۆکە و ئۆتۆمبێل و پاك کردنەوەی جلی پیس بەکار ئەهێنرێ. |
| بنزوات الصوديوم | Sodium benzoate | (سۆدیۆم بەنزەوەیت) مادەیەکە ئەکرێتە خواردەمەنی قوتووەوە بۆ ئەوەی خراپ نەبێ. |
| بنزول- بنزين | Benzol= Benzene | (بەنزین، بەنزۆل) مادەیەکی کیمیاییە لە کاربۆن و هیدرۆجین پێك دێ لە دڵۆپاندنی قەترانی خەڵوز دەرئەهێنرێ، باشترین توێنەرەوەیە بۆ زۆربەی مادەکانی تر وەکو چەوری، بۆ دروست کردنی پلاستیك و ئەسپرین بەکاردێت. |
| بنزوين | Benzoin | (بەنزەوین) جەوی، مادەیەکی راتنجییە بۆن خۆشە لە قڵیشانەوەی توێکڵی داری جاوی دێتە دەرەوە، بۆ چارەکردنی کۆکە بەکارئەهێنرێت، وە لە سروشتدا بەشێوەی ئارەق لەقەدی درەخت دێتە دەرەوە، هەروەها وەکو بفورد (بخورد) بەکاردێت. |
| بنسلين | Penicillin | (پەنسلین)، دەرمانێکە لە کەڕووی سەوز دەئەهێنرێ بەشێوەی دەرزی یان مەڵحەم دژی نەخۆشی و برین بەکاردێت وەکو چارەکردنی ئاوسانی ئەندامەکانی لەش. |
| بنسيليوم | Penicillium | (پەنسیلیوم)، جۆرە کەڕوویەکە مادەی پەنسلین پەیدا ئەکات. |
| بنش | | (بەنش) جۆرێکە لە مەی بریتییە لە تێکەڵاوی ئەلکهول و ئاوی لیمۆو بەهارات و چایی. |
| بنصر | Ring finger | (رینگ فینگەر) برای تووتە، پەنجەی نێوانی ناوەڕاست و پەنجەی تووتە، پەنجەی دووەم لە بچووکەوە. |
| بنط | | نەخۆشییەکی ڕووەکییە تووشی گەنم و جۆ ئەبێ، دەنکەکانیان ڕەش و بۆگەن ئەبێ. |
| بنطلون | Trousers | (تراوزەر) پانتۆل، شەرواڵ. |
| بنغول، بنغولين | Pangolin | (بەنگۆلین)، گیاندارێکی بێ ددانی مێروولە خۆرە، لەشی بە پوولەکە داپۆشراوە، پێستەکەی لە پێستی تیمساح ئەچێت، لەکاتی مەترسیدا خۆی گلۆلە ئەکات. |
| بنغردية | Golden rod | (بۆنگاردیا، گوڵدن ڕۆد) دەوەنێکە لقەکانی زەردە، گەڵاکەی فستقییە، گوڵی جوان ئەگرێت بۆ رازاندنەوە. |
| بنفسج | Violet | (ڤایۆلێت) بنەوشە، وەنەوشە، چەند ساڵێك ئەژی، قەدی نییە، گەڵاکانی یەکسەر لە ناوچەی ڕەگەکانەوە دێنە دەرەوە، گوڵەکانی تاکە تاکەو بۆن خۆشن، ڕەنگێکی بنەوشەیی تێریان هەیە، هەندێ جاریش سپی و پەمەیی ئەبن، بەڵام قەدی خشۆکی هەیە لە ژێر یان لەسەر زەوی. |
| بنفسج الكلاب - شاهبانج | Inula conyza | شابانە. ڕووەکێکی پزیشکییە. |
| بنفسجي | Violet (coloor) | بنەوشەیی، ئەرخەوانی، مۆر. |
| بنقسية | | دارو دەوەنێکی ئوسترالییە. |
| بنقوسيا | | (بانکاسیا) دارو دەوەنێکە گوڵی زەرد ئەگرێت بەرەکەی لە بەری سنەوبەر ئەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| بنك - مصرف | Bank | (بانك) بانق. |
| بنك عقاري | Land bank | بانقی زەوی‌وزار. |
| بنكنوت | Banknote | (بانك نۆت) بانقە نۆت، پارەی كاغەز. |
| بنكرياس | Pancreas | (پەنكریاس)، شیپلك، لوویەكە لە پشت گەدەوەیە، شلاوێكی تایبەتی دەرئەدات بۆ هەرس كردنی خواردەمەنی. |
| بني | Barbel | (باربوس، باربیل)، جۆرە ماسی‌یەكی قاوەیی‌یە، "سوورە ماسی" قاوەیی، شێتاری. |
| بني محمر | Bay= roan | شێ، كوێت، رەنگی شێ، رەنگی كوێت. |
| بنية | Stroctore | پێك، پێك هاتنی لەش. |
| بنيقة | Gore | تیرۆژی كراس، خشتەك. |
| بواب | Pylorus | (پیلورەس) دەرگاوان، كونی نێوانی گەدەو ریخۆڵەی دوانزاە گرێ. |
| بواء- بوا | Boa | (بوا، بایثون) ئاژدیها، جۆرە مارێكە خۆی دەئاڵێنێت لە نێچیرەكەی وەبە جەراندن ئەی تاسێنێ. |
| بوال | Polyuria | (پولیبوریا) دەڵەمیز. |
| بوا الرمال | Sand boa | جۆرێكە لە مار لەناو لمدا ئەژی، ژەهری نی‌یە. |
| بوار | Destruction | وێرانە، كەلاوە. |
| بوابة | Gate | دەروازە. |
| بواسير- بوسير | Piles | مەیاسیری بریتی‌یە لە پەیدابوونی چەند گۆپكەیەك یاخود لوولەیەك یان گرێ‌یەك لە دەورووپشتی كۆم یاخود لە ژێر پەردەی ریخۆڵەی راستا. مایەسیری، پیسۆر. |
| بؤ بؤ العين | Pupil | (پیوپڵ) چاوانە، كەچكی چاو، بیبیلەی چاو، بیبیكە، پیبك. |
| بؤرة "للعدسة" | Focus | (فۆكەس، تیشكۆ) كۆ رووناكی، ئەو خاڵەی كە تیشكی رووناكی تیا كۆ ئەبێتەوە. |
| بؤرة الزلزال | Earth shaking focus | سەرچاوەی بومەلەرزە. |
| بؤرة - مصدر | Source | سەرچاوە. |
| بوياب- باوياب- حمراء- شجرة- خبز القرد | Baobab= monky bread | (ئەدانسونیا، باویاب، مونكی برید) دەوەنێكی یەكجار گەورەیە گوڵەكەی بۆرو سوورە، بەرەكەی هێلكەیی‌یە بەقەدەر پرتەقاڵێك ئەبێ و ترشە، تۆوەكەی چەورە بۆ مەبەستی پزیشكی و پیشەسازی بەكاردێت. |
| بويانة | Flycatcher | (فلای كاچەر) مێش گر، جۆرە باڵندەیەكە لە كۆمەڵەی چۆلەكە. |
| بوت | Black thorn | (بلاك ثۆرن) گوێژە رەشە، درەختێكی مام ناوەندی‌یە گەڵاكەی پارچە پارچەیە گوڵێكی سپی یان پەمەیی ئەگرێت لە ناوچە فێنكەكان ئەروێت. |
| بوتر | Rock dove | كۆتری حاقو. |
| بوتاسا | Potash | (پۆتاش) پۆتاسیۆم ئۆكساید، ئاوێتەیەكی باشە بۆ رووەك ئەكرێتە پەینەوە. |
| بوتاس كاوية | Caustic potash | پۆتاسی داخ كەر، پۆتاسی سووتێنەر. |
| بوتاس | Potassium hydroxide | (پۆتاسیۆم هایدرۆكساید) (پۆتاس) پۆتاسیۆم كاربۆنەیت، مادەیەكی كریستاڵی سپی‌یە. |
| بوتاسيوم K | Potassium | (پۆتاسیۆم، كالیوم) كانزایەكی كیمیاگەری‌یە كێشی ئەتۆمی‌یەكەی (٣٩)و ژمارەی ئەتۆمی‌یەكەی (١٩)یە، كانزایەكە رەنگی سپی زیوی‌یە ماناكەی لە وشەی (كالیوم) واتا (پۆتاسیۆم كاربۆنەیت) وەرگیراوە. |

| | | |
|---|---|---|
| بوتان | Butane | (بۆتان) گازێکە لە کاربۆن و هایدرۆجین پێك دێ، بەشێوەی سووتەمەنی بەکار ئەهێنرێت. |
| بوتقة- بودقة | Crucible | (کروسیبل) بۆتە. |
| بوتية اللك | Lac tree | (پالاس تری) درەختی لۆك، درەختێکە ئەگەر قەدەکەی بریندار بکرێت ئاوکێکی زەمقی سووری لێ دێتە دەرێ و ئەبێت بە لۆك. |
| بودر | Powder | (پاودەر) پۆدرە، هاڕاوەیەکی سپییە لە مادەی مەگنیسیۆم سلیکەیت پێك هاتووە ئەکرێت بەلەشەوە دژی لیر و گرمەژنە. |
| بودنغ | | شیربرنج، جۆرە حەڵوایەکە لە برنج و شیر و هێلکە و میوەو شەکر. |
| بور- بائر | Waste land = fallow land | فالولاند، بەیار، زەوی نەکێڵراو، پایەر، باهێر. |
| بوراکس- بورق | Borax | بۆراکس - بۆرەك (سۆدیۆم بۆرەیت) مادەیەکی سپی کریستاڵە لە سۆدیۆم و بۆرون و ئۆکسجین پێك هاتووە، هەندێ جار ئاوی تیایە بۆ سپی کاری و دروستکردنی شووشە بەکار ئەهێنرێ. |
| بورق | | بگەڕێرەوە بۆ (بوراکس). |
| بوری | | پاتۆنیا. |
| بورفيرين | Porphyrin | (پۆرفیرین) مادەیەکی بێ ڕەنگە لە کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین و نایترۆجین پێك هاتووە. |
| بورون B | Boron | بۆرۆن. توخمێکی کیمیایییە کێشی ئەتۆمییەکەی (١٠,٨٢)ی و ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٥)، ڕەنگێکی زەردی مەیلەو قاوەیی هەیە، ماناکەی لە وشەی (بوراکس) واتا "سپی"یەوە وەرگیراوە نیشانەکەی (B)، بۆرۆن. |
| بوري | Mullet | (مولیت، موگیل) ماسییە جوولەکانە، جۆرێکە لە ماسی ڕووباری. |
| بورصة | Boursa= Exchange | کۆمەڵەی بازرگان و سەڕاف و دەڵاڵەکان کە کار ئەکەنە سەر نرخی پارەو جوڵانەوەی بازرگانی. ئاڵوگۆڕ، گۆڕینەوەی پارە. |
| بورية | Mat of reed | حەسیرێك کە لە قامیش دروست کرابێت. |
| بورات | Borate | (بۆرەیت) خوێی بۆریك ئەسید. |
| بورصة | Boursa | بۆرسە - شوێنی پارە گۆڕینەوە. |
| بوز | Nozzle | (نۆزڵ) (لمۆز). |
| بوزيترون | Positron | (پۆزیترۆن) بەشێکە لە ناوکی ئەتۆم، کارەبای گەرمی لەسەرە بەقەدەر ئەلیکترۆن ئەبێت لە بارستاییدا. |
| بوسير | Pile | مایەسیری، مەیاسیری. |
| بوسطن | Boston Terrion | (بۆستن)، جۆرە سەگێکی بچووکە تووکەکەی کورت و نەرم و شلە. |
| بوشل | Bushel | (بوشیل)، یەکەی پێوانی مادەی ووشە ئەکاتە (٣٦) لیترە. |
| بوص | Linen textile | چنراو، دەزوی کەتان. |
| بوصة | Inch | ئینچ، ٢,٥٤ سانتی مەتر. |
| بوص- قصب | Reed | (ریید) قامیش. |
| بوصلة- بوصلة مغناطيسية | Compass | (کومپاس) قیبلە نما، قیبلە نوێن، ئامرازێکی کۆنە بۆ دۆزینەوەی پۆڵی موگناتیسی. |
| بوصلة - جايروسكوبية | Gyrocompass | قیبلە نمای خولاوە. |
| بوصلة برنتون | | قیبلە نمای برنتۆن، جۆرێکە لە قیبلە نما ئامرازێکی پێوەیە بۆ بینین. |

| | | |
|---|---|---|
| بوصير- اذان الدب- مسكر الحوت | Mullen | گوێ وورچه (مولين، كاووس لنگ ؤرت) گیایەكی دەشتەكییە لەسەرەڕێدا ئەڕوێت گوڵی زەرد یان قاوەیی كاڵ ئەگرێت. |
| بوظة | Ice-cream | دۆندرمە، بەستەنی، ئایسكرێم. |
| بوغ حيواني | Zoo spor | (زوو سپۆر) سپۆرێكی گیانداریییە. |
| بوغ - سبور - بذرة | Spore | (سپۆر)، تەنێكی یەك خانەییە ئەبێت بە زیندەوەر وەكوو لە میكرۆبی لەرزۆتادا، تۆو. |
| بوغاز | Strait | (سترەیت) تەنگە، ئاوێكە دوو دەریا ئەگەیەنێ بەیەكەوە كەوتۆتە نێوانی دوو زەوییەوە تەنگە زەوی، بەندەر. |
| بوفية | Buffet | (بوفیت) بۆفی، دۆڵابی كەلوپەلی چێشتخانە. |
| بوق | Trumpet | (ترامپیت) توتوك، زوڕنا، كەڕەنا، شەیپوور، ئامرازێكی مۆسیقایە. |
| بوقير- ابوقرن | Horn bill | (هۆرن بێل، بوسیروس) باڵندەیەكی دەنووك زلە. |
| بوق | Whel = whelk | (بوكین) شەیتانۆكەیەكی دەریایی گەورەیە. |
| بوق النشر | | (كریتەریلوس) جۆرە قارچكێكە كلاوەكەی بۆ شەو ئەخورێت. |
| بوقة- حنشات | | ڕووەكێكی سەلك دارە، ئاوێك لەسەلكەكەی دەرئەمێنرێت و ئەكرێت بە شەراب. |
| بوقيصا- بوقيصان - جميز | Sycamore | (سایكامۆر) بنـاف، ڕەشـەدار، ووزم، "ن" دارە ڕەش، بنـاو، نـارەوەند، قەرەقاج، زمانەچۆلەكە، درەختێكی ناوچە ساردەكانە تەختەكەی نەرمە بۆ ڕازاندنەوەی باخچەكان بەكاردێت. |
| بوكر | Poker | پۆكەر، جۆرە یارییەكە بە كاغەز دەكرێت. |
| بوكسايت | Bauxite | (بوكسـایت) ئۆكسـیدی ئـەلەمنیۆمی ئـاوی، (ئەلـەمنیۆم) (هایدرۆكسـاید) كەرەسەیەكی خاوە ئەلەمنیۆمی لێ دەرئەهێنرێت. |
| بوليغراف | Poly graph | (پۆلیگراف) ئامرازێكە بۆ تۆماركردنی جووڵەیەكی كارەبایی و میكانیكی لە هەمان كاتدا. وەكوو شـەپۆلی پرتـەو پاڵـە پەسـتۆی خوێـن و جووڵـەی هەناسەدان و شەپۆلی مێشك، دۆزەرەوەی درۆ. |
| بول | Urine | (یوراین) میز. |
| بولاريمتر- مقطاب | Polari meter | (پۆلاریمەتر) ئامرازی پێوانی لادانی تیشكی ڕووناكی. |
| بولينا | Urea | (یوریا)، جەوهەری میز. |
| بوليس - شرطة | Police | پۆلیس. |
| بوليسيفونيا | Red lichen | (پۆلیسیفۆنیا) قەوزەی سوور. |
| بولونيوم Po | Polonium | (پۆلۆنیـوم) توخمێكـی كـانزایی كیمیاگەرییـە كێشـی ئەتۆمییەكـەی "٢١٠" و ژمـارەی ئەتۆمییەكـەی "٨٤"ە ماناكـەی لـە ووشـەی (پۆلنـدە) وەرگیراوە. توخمێكی تیشك دەرەوەیە. |
| بولدوزر- منساخ- شوفل | Shovel | (بۆلدۆزەر) (شۆڤڵ) مەكینەیەكە بۆ ڕێگاوبان كردنەوە. |
| بولزار | | (بولـزار) جـۆرە ئەسـتێرەیەكە بـە ووچان ڕووناـكی ئـەدات، وە بەردەوامـە لەسەر ئەم كارە. |
| بوليصة - سند تامين | Policy | پسووڵەیەك كە بەرامبەر پارە یان شتومەك وەرگیرا بێت. |
| بوليب | Polyp | (پولیپ)، گیاندارێكی سەرەتایی ئاوییە وەكوو (هایدرا)و مەرجان. |
| بوليمر | Polymer | (پولیمەر) جـۆرە ئاوێتەیـەكی كیمیاییـە. لـە ئـەنجامی یـەكگرتنی چـەند گەردێك لە مادەیەكی تایبەتی دروست بووە. |

| | | |
|---|---|---|
| بوليبوديوم - بسفايج | Polypodium | (پولیپۆدیۆم)، جۆرێکە لە ڕووەکی کەرموزە کێویلە واتە سەرخەس. |
| بول سكري | Diabetes | (دیابیت) نەخۆشی شەکر، لووی پەنکریاس هۆرمۆنێك دروست ئەکات پێی ئەوترێ (ئەنسولین) فرمانی گۆڕینی شەکرە بۆ ووزە ئەگەر پەنکریاس نەخۆشکەوت ئەوا شەکرەکە ناگۆڕێت وە لە خوێنا ئەمێنێتەوەو هەندێکی لەگەڵ میزا دێتە دەرەوە. |
| بولومتر - محر اشعاعي | Bdometer | (بۆلۆمیتەر)، ئامرازێکی هەستیارە بۆ پێوانی تیشکی گەرمی بەکاردێت. |
| بوم- بومة | Owl | (ئۆوڵ) (ۆوڵ) شابو، کونگەبەبوو. بوو، بوومکەرە، بومە کوێرە، بووە تەقلە کوندە بەبوو، بایەقوش پەپوومکەرە، پەپۆك. |
| بومة بيضاء | White owl | فشفشە، بایەقوش. |
| بومة الجليد | Show owl | کونگە بەبووی سەهۆڵ، بایەقوشی سەهۆڵ. |
| بوميات | Strigidae | (ستریکیفورمس) کۆمەڵەی کونگە بەبوومکان. |
| بوميلو | Pomelo | (شادۆك) پۆمیلو، درەختێکە لە کۆمەڵەی لیمۆ بەرمکەی یەکجار گەورەیە نزیکەی (١٠) ڕەتڵ ئەبێت، توێکڵەکەی سەوزە، جۆرێکە لە لیمۆی ترش گەورەو سەوزە. |
| بومباكسي - قابوق - قطن كاذب | Bom bax = kapock tree | لۆکە درۆزنە = درەختێکی گەورەیە بۆ ڕازاندنەوە، نزیکەی (٤٠) مەتر بەرز ئەبێتەوە، لقەکانی بۆ تەنیشتی فرێ ئەدات چین چین، قەدو لقەکانی بە ڕەنگی خۆڵەمێشی و دڕکاوین، گوڵەکانی بەشێوەی هێشوون بە ڕەنگی سووری مەیلەو ئاڵ، گەڵاکانی ئەوەرێ، ئەم درەختە زەمقی لێ دەرئەمێنرێ، وەلە توێکڵەکەی جۆرە گوشێکی لێ دەرئەمێنرێ کە لە لۆکەیەکی ئاوریشمی ئەچێت و ئەکرێتە سەرینەوە. |
| بوني | Pony | (پونی) ئەسپێکی بچووکی سوکەڵەیە. |
| بون- بون | Distance | جیاوازی، ماوە. |
| بونسيانة | Poinciana | (پۆینسیانا) درەختێکی جوانە نزیکەی (٨-١٠) مەتر بەرز ئەبێتەوە، گەڵاکانی گەورەیە، گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی سووری کاڵی بریسکەدارە بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت. |
| بونيت- بينيث | | (بۆنیتس) جۆرە ماسییەکی دەریایی سەرپانی شینە. |
| بوهة- بعفة- بوة | Eagle owl | (ئیگل ئۆوڵ) پەپووە هەڵۆ، کونگە بەبووی شاخدار، کوندەبەبووی هەڵۆ، کونگە بەبووی بایەقوش. |
| بوهينا | | پێووشتر، درەخت یاخود دەوەنێکی بچکۆلەیە لە باخچەکاندا ئەڕوێنرێ لەبەر جوانی گوڵەکانی، گەڵاکەی سەیرو دووپارچەیە لە پێی ووشتر ئەچێت، گوڵی هەمە ڕەنگەی هەیە بەشێوەی هێشوو، بە ڕەنگی سوور یان سپی. |
| بوهينية | Baohinia | (باوهینیا) دەوەنێکی جوانە گوڵی ئەرخەوانی ئەگرێت و بۆ ڕازاندنەوە ئەڕوێنرێت. |
| بويب | Micropyle | کونۆچکە، دەرگایەکی بچووکە لە تۆوی هەموو ڕووەکێکدا بۆ مژینی ئاو لە کاتی چاندنا بۆ سەوز بوون. |
| بويز | Poise | یەکەی پێوانی لینجی. |
| بويضة- بويض | Ovum | گەرا، پرگە. |
| بويضات السمك | Caviar | وڵتە. گەرای ماسی - کافیار. |

| | | |
|---|---|---|
| بويضة مخصبة | Germoplasm | (جەرمۆپلازم) گەرای چاك كراو، گەرای جووت گرتوو. |
| بويمة- بومة صغيرة | Owlet | حەق حەق كەرە، كونگە بەبوویەكی بچووكە. |
| بوية | Pint | (پێنت) بۆیە. |
| بهاء مريم | | (كالوفیلوم) درەختێكی گەورەیە، لە ناوچە گەرمەكاندا ئەژی، زەمق و ڕۆنی بۆن خۆشی لێ دەردەهێنرێت. |
| بهار - تابل | Spice | (سپایس، سیزنیگ) بەهارات، هەر ڕووەكێكی تام و بۆن خۆش بەشێوەی ڕەگ یان قەد یان گەڵا یان بەریان تۆو بكرێتە خواردەمەنی‌یەوە وەكو: ڕەشكە و شەلی. |
| بها- عصيفرة- بها- مجزاعة | Garden balsam | (گاردن بالسام) بەلسەمی باخچە، گیایەكە گوڵی هەمە جۆرە ئەگرێت. |
| بهار | | (دیاكۆپ بوهار)، جۆرە ماسی‌یەكە. |
| بهار- عراد | Anthemis | (ئەنسیمس) جۆرە ڕووەكێكە، هەمیشەبەهار. |
| بهاريات | | (ساینیدا) كۆمەڵە ماسی‌یەكی ئێسك دارن پەرەكانیان دركاوی‌یە. |
| بهت | To be amazed | سەرسوڕمان. |
| بهت | Recundation | (پاتتینگ)، چاك كردن پەراندن، ئەوەیە كە گیاندارێكی مێ ی بەكەڵ بخرێتە بەردەمی نێرە بۆ چاك كردنی. |
| بهثة | Wild cow | مانگا كێوی. |
| بهجة- رونق | Brilliance | (بریلیانس) جوانی، خۆشی. |
| بهج | Pleasant | (پلێسانت) دڵگیر، دڵخۆشكەر. |
| بهدل | Xonghyena | (یۆنك هاینا) بێچووی كەمتیار. |
| بهدلة | The origin of the breast | بێخی مەمك. |
| بهر | Breath lessness | (برێثلێسنێس) ماندووبوونی زۆر. شەكەتی. |
| بهريز | Diet | پارێز، پارێزكردن. |
| بهرمان | | باڵندەیەكی ئاوی‌ی شینی مەیلەو بنەوشەیی‌یە، دەنووك و قاچی سوورە. |
| بهرجان- تينسيل | Tinsel | (تینسیل)، شریت و دەزوو كاغەزی ڕەنگاو ڕەنگ بۆ ڕازاندنەوە. |
| بهرامج | Balchia willow | درەختێكی شاخی‌ی بۆن خۆشە. جۆرێكە لە داری بی. |
| بهرانة | | (فوركرایا) ڕووەكێكە لە كۆمەڵەی نێرگز. |
| بهرم- قرطم | Safflowch | (كارثیم)، جۆرە ڕووەكێكە. |
| بهرمان- ياقوت جمري- عقيق احمر | Carbuncle | (كاربەنكل) بەردێكی بەنرخی سوورە، یاقیقی سوور. |
| بهرزة | | ئەو ڕووەكەی كە بە ڕێگەیەكی دەستكرد ئەڕوێنرێت بۆ مەبەستی چاك كردنی وەچەكەی. |
| بهشية | Holly | (هۆلی تری، ئێلكس)، درەختێكە گەڵاكەی دركاوی‌یە گوڵێكی بچوكی سپی دەگرێت، بەرەكەی خڕو سوورە، تەختەكەی بەنرخە. |
| بهش- سنديان شوبر | Cork oak | (كۆرك ئۆك) درەختی تەپەدۆر، درەختێكە توێكڵەكەی نەرمەو دەكرێت بە تەپەدۆر، بەرووی تەپەدۆریشی پێ دەوترێت. |
| بهشية الدبق- طيم- عود الخير- شجرة عيد الميلاد | Christmas tree | (هۆلی، هۆلم، كریسماس تری)، درەختی كریسمس، درەختێكە بەرەكەی وەك ترێ وایە دەموكانەی لێ دەرئەهێنرێت. |
| بهشية الشاي- شاي براغواي- ماتي | Mate | (پاراگوای تی، ماتی)، چایی پاراگوای، درەختێكە بەرەكەی سوورە گەڵاكەی وەك چایی بەكاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| بهطة | Soap | شۆربا. |
| بهظم | | گیاندارێکی کەتەی قڕتێکەوتووە. |
| بهق - وضح | Vitiligo | (ڤیتیلیگۆ) بەڵەکی، پەڵەی سپی کە لەسەر پێست پەیدا دەبێت. |
| بهق الحجر | Lichen | (لایچن) چوزەوارە، جۆرە قەوزەیەکە بەسەر بەردەوە ئەڕوێت. |
| بهلوان | Acrobat | تەنافباز، "پاڵەوان" (ئەکروبات). |
| بهم | Beast | (کاتڵ) ئاژەڵ. |
| بهمة | Young of cow | بێچووی ئاژەڵ (یۆنگ ئۆف کاو). |
| بهموث | Extict-elephant | (ماموث)، جۆرێکی قڕتێکەوتووە لە فیل. |
| بهمن ابیض- قنطریون | Centauria | (وایت بێهن) جۆرە ڕووەکێکە. |
| بهو | Saloon | "هەیوان" ژووری میوان (سالۆن)، (هۆڵ). |
| بهی | Beautiful | جوان، نەشمیلە، شەنگ. |
| بهیمة- دابة- زاملة | Beast | چوارپێ، ئاژەڵ، ڕەشەووڵاخ، چارەوا،ووڵاخ، گیاندار، (بیست). |
| بهیمة | Bestiality | "ئادەمیزادێك کە لە خووی گیانەوەردا بێت". |
| بهیت | | (میری مێکینگ)، نێرێك کە توانای پەڕینی نەبێت. |
| بهیة | | (کالیدیوم)، جۆرە مێرووییەکی ڕەنگینە. |
| بهیموت - فرس النهر | Hippopotamus | (هیپۆپۆتاموس)، ماینی ڕووبار - برنیق. |
| بیات | Lodging | (مانەوە). |
| بیات- بیات شتوي- سبات شتوي | Hibernation | (هایبەرنێشن) سڕبوون مات بوون، سڕبوونی گیاندار لە زستاندا. |
| بیار- اسقمری | Mackerel | بیار، جۆرە ماسییەکە. |
| بیاءة | Environmental Science | (میسۆلۆجی) زانستی شوێنەوار، زانستی ژینگە. |
| بیارة- بستان | Orchard | (ئۆرچارد) باخی پرتەقاڵ. |
| بیاضة | | (باگرەس باجاد) جۆرێکە لە مار ماسی. |
| بیاض | Whiteness | (وایتنێس) چۆڕ، سپێتی، چەرمێنە، سپێنە، تەڕاو، دۆخاو. |
| بیانو | Piano | (پیانۆ) ئامرازێکی مۆزیقەیە. |
| بیان الولادة | Declaration of birth | ڕاپۆرتی منداڵ بوون، زاییچە. |
| بیاض العین | Sclaara | سپێنەی چاو، چەرمێنەی، بەزی چاو، ڕەقێنەی چاو. |
| بیاض دقیقي | Puwdery- mildew | (پاودری میلدیو) نەخۆشییەکی ڕووەکە، تووشی دەغڵ ودان دەبێت، وەکو گەنم و جۆ.. بەهۆی جۆرە کەڕووییەکەوە پەڵەی خۆڵەمێشی مەیلەو سپی لەسەر گەڵاکانی پەیدا دەبێت، ئینجا پەڵەکان ڕەش دەبن و ئەتەقن.. وە ڕووەکەکە ئەمرێت یان گوڵ ناکات، دۆوکە، مرە. |
| بیاض زغبي | Downy mildew | (دۆونی میلدیوو) نەخۆشییەکی ڕووەکە، تووشی هەندێ ڕووەك دەبێت وەکو پیاز وە پەڵەی ڕیشاڵدارلە سەرگەڵاکانی پەیدا دەبن و گەڵاکانی شۆڕ دەبنەوەو ئەمرن وە هەروەها شکۆفەی گوڵەکانی شۆڕدەبنەوەو تۆو ناکەن وە سەلکە پیازەکەش بچکۆلەو نەرم دەبێت، وە هۆی ئەم نەخۆشییەش جۆرێکە لە کەڕوو. |
| بیاض الزنك- بیاض الخارصین | Zinc oxide | زینکی سپی، (زینك ئۆکساید) ژەنگی توتیا. |
| بیاض البیض | Albumen | سپێنەی هێلکە. |
| بیاض في شعر الراس | To whiten | تیلاك، سپێتی لە قژی سەردا. |

| | | |
|---|---|---|
| بياح - بوري | Mugil | (موگیل) جۆرێکە لە ماسی. |
| بيئة | Habitat= Environment | شوێنەوار، دەورووپشت، دەورووبەر، ژیانگە، ژینگە، (میدیەم، هابیتات، ئینڤایرنمێنت). |
| بيان الزوجية | Marriage linec | خێزان نامە. |
| بياض النهار | Day light | (دەی لایت) سپێدەی ڕۆژ. |
| بيان | Explanation | بەیاننامە. |
| بيانات | Data | (داتا)، چەند زانیارییەك یان دەنگوباسێك دەربارەی بابەتێك. |
| بيبرين | Piperine | (پیپرین)، ئاوێتەیەکی تیژە لە دەلو بیبەردا هەیە.. |
| بيبة- غليوت. | Pipe | دارجگەرە. |
| بيب | Suply pipe | (سەپلای پایپ)، جوڕنە. |
| بيبة هندية | | ڕووەکێکە لە تووتن دەچێت. |
| بيبسى كولا | Pepsi colla | (پیپسی کۆللا) جۆرە شەربەتێکە. |
| بيبيون | | (بیبیو)، جۆرە مێروویەکی زیان بەخشە بە ڕووەك. |
| بيت الماء- بيت الخلاء | Necessary house | ئابخانە، ئاودەسخانە، ئاودەست، پێشاو. |
| بيتومين | Bitumen | (بیتومین)، قیر. |
| بيتروليوم | Petroleum | (پیترۆلیۆم)، ڕۆنی بەرد، نەوتی سروشتی. |
| بيتاترون | Betatron | (بێتا ترۆن)، دەزگایەکە بۆ پترکردنی خێرایی ئەلەکترۆنەکان بۆ ئەوەی بگیرێتە ناوکی ئەتۆم بۆ مەبەستی تێکدان. |
| بيت من الشعر ٢ خيمة | Tent | ڕەشمال، دەوار، "تاوول". |
| بيت الابرة | Compass | (کۆمپاس)، قیبلە نما. |
| بيت | House= Hom | (هاوس، هوم)، خانگ، ماڵ، خانوو، "یانە". |
| بيت المال | Public | (پەبلیك تریژەری)، خەزێنە. |
| بيترترات البوتاسيوم | Potassium bitartarate | (پۆتاسیۆم بایتارتارەیت)، یەکێکە لە خوێیەکانی پۆتاسیۆم بەڕادەیەکی کەم لە شەرابدا هەیە. |
| بيجل | | جۆرێکە لە سەگی ڕاو لاقی کورتە، تووکەکەی نەرم و شلە. |
| بيدانة | Wild ass | کەرە کێوی. |
| بيدستر- حارود | Beaver | (کاستۆر)، سەگلاو، سەگی ئاوی. |
| بيدق | Sparrow hawk | ١-جۆرێکە لە باڵندەی واشە گۆشت خۆرە (کاست نێت). |
| | Pawn | ٢-شاژن لە یاریی شەترەنجدا (پۆون). |
| بيدو- جرين | Thresshing floor | (ئەریا) خەرمان، جۆخێن، دراخە، سوخار. |
| بيدر صغير | | شارا، مەلۆ. |
| بيدر مدروس | | "خەرمانی گێرە کراو". |
| بيد مجنون | Weeping willow | شۆڕەبی، شەنگەبی. |
| بيداء- فلاة | Wold= Down | (پلێن)، چۆڵی، بیابان، (وۆڵد). |
| بيداجوجيا | Pedagogy | (پیداگۆجی)، زانستی یان هونەری وانە ووتنەوە. |
| بيدولوجيا | Pedology | (پێدولۆجی)، زانستی گڵ، زانستی خاك. |
| بيرق | Flag | (فلاگ) بەیاخ. |
| بيرة | Beer | (بییر) بیرە، ئاوی جۆ، جۆرێکە لە مەی. |

| | | |
|---|---|---|
| بيرم- عتلة | Iron bar | نوێڵ، بێرم، برازه. |
| بيروكسيد | Peroxide | (پايروكسيد)، ئەو ئۆكسيدەيە كە لە موليكيولەكەيدا دوو ئەتۆم ئۆكسجين هەيە وەكوو: هايدرۆجين پايرۆكسيد. |
| بيروگالول | Pyrogalol | (پايروگالۆل)، (پايروگاليك ئەسيد)، بەشێوەی تەلاشێكی سپی‌يە، زوو ئەبێت بە هەڵم، لە ئاودا ناتوێتەوە، بۆ وێنەگرتنی فۆتۆگرافی بەكاردێت. |
| بيريرا | | (بيريرا) درەختێكی بەرازيلی گەورەيە، توێكڵەكەی بۆ بەهێزكردن و دژی تاو هێواشكردنەوەی لێدانی دڵ و هەناسە بەكاردەهێنرێت. |
| بربيرات الصوديوم | Sudium perborate | (سۆديۆم پێربۆرەيت)، مادەيەكە بۆ لابردنی رەنگی ڕيشاڵی گيانداری بەكاردەهێنرێت. |
| بيرين | Pyrene | (پايرين) ئاوێتەيەكە لە دڵۆپاندنی قەترانی خەڵوز پەيدا دەبێت، بێ ڕەنگە، لە ئاودا ناتوێتەوە، بەڵكو لە ئيثەردا دەتوێتەوە. |
| بيريدين | Pyriden | (پايريدين)، ئاوێتەيەكە لە قەترانی خەڵوزدا هەيە، بريتی‌يە لە شلەيەكی بێ ڕەنگ، بەرهەڵستی ئۆكسيد بوون دەكات. |
| بيركليوم | Berkellum | (بێركلێۆم)، توخمێكی ميتاڵە ژمارەی ئەتۆمی‌يەكەی (٩٧) و كێشی ئەتۆمی‌يەكەی (٢٤٩) نيشانەكەی (BK) تيشك دەرەويە. |
| بيرومتر- مضرم | Pyrometer | (پيرۆميتەر)، گەرمی پێوێكە واتا (تەرمۆمەترێكە) بۆ پێوانی پلەی گەرمی بەرز وەكوو پلەی گەرمی تەنووری دەستكرد. |
| بيرومترية | Pyrometry | (پيرۆميتەری)، پێوانی پلەی گەرمی‌ی بەرز. |
| بيريليوم | Beryllium | (بێريليوم) توخمێكی ميتاڵە ژمارەی ئەتۆمی (٤) و كێشی ئەتۆمی (٩) نيشانەكەی (Bc)يە. |
| بيريل | Beryl | (بێريل)، بەردێكی بەنرخە وەكوو زمڕوت، سەوزە. |
| بيريت- حجر النار | Pyrite | (پايريت)، (فيريك سەلفايد)، ئاوێتەيەكی زەردە ئاسن و گۆگردی تيايە. |
| بيساني- بليوسين | Pliocene | (پليوسين)، سەردەمێكی جيۆلۆجی‌يە. سەردەمی تازەی نزيك. |
| بيسون | Bison | (بيسون)، گای ئەمەريكی، جۆرە گايەكە شانی دوگی پێوەيە. |
| بيسة- مهاة | Wild cow= Oryx | مانگا كێوی، (ئۆريكس بيسا). |
| بيسم | | درەختێكە لە بەڕوو ئەچێت بەرەكەی وەك بەهێ وايە. |
| بيش | Aconite= Wolfsbane | (خانق الذئب) گورگ خنكێن ڕووەكێكی تەمەن درێژە و ژەهرينە لە ناوچەی شاخەكان دەڕوێت، مادەيەكی ژەهری كوشندەی تيايە بۆ مەبەستی پزيشكی و دژی كۆڵنج بەكاردێت. (ئەكونيت، ولفس بێن). |
| بيض- بيضة | Egg | هێلكە (ئۆڤيوم)، (ئێگ)، خايە، زەبرەقون، هێك. |
| بيضوي، بيضي | Oval | هێلكەيی (ئۆڤاڵ)، (ئێگ شێد). |
| بيضة غضية | Ovum | گەرا، ووڵ ووڵە، هێلكە پێش ئەوەی كە توێكڵی بۆ دروست بووبێت. |
| بيضة ناضجة | Mature egg | هێلكەی پێگەيشتوو. |
| بيضة مخصبة | Fertilized egg | هێلكەی پيتێنراو، هێلكەی جووت كراو. |
| بيض الحمام | | هەرزاڵە، هەرمزاڵە، جۆرە گيايەكە لە بەهاران دا هەيە، بەرێكی ووردی هێشوويی دەگرێت، وەك تەماتە سوور دەبێت و ئەخورێت. |
| بيض القمل | Lice ovum | ڕشك. گەرای ئەسپێ. |
| بيض الارض- سرغة | Hawks beard | (هۆكس بێرد)، ڕيشی هەڵۆ، جونگ، چونگ، گوڵە بەهارە، گوڵێكە زار، جۆرە گيايەكە گوڵێكی زەردی بۆن خۆش دەگرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| بيض بالدهن | Fried eggs | هێلکەو ڕۆن. |
| بيض الحضنة | Covery | (کۆڤەری) ڕاوکە، هێلکەی ژێر مریشك. |
| بيض الشيخ- اذن الدب- بذرة الريح | Wind seed | (ویندسیید) تۆوی با. |
| بيض برشت- نيمبر شت | Soft boiled egg | هێلکەی دەڵەمە (سۆفت بۆیلد ئێگ). |
| بيض مسلوق | Hard boiled egg | هێلکەی کوڵاو (هارد بۆیڵد ئێگ). |
| بيض مقلي | Fried egg | هێلکەو ڕۆن (فراید ئێگ). |
| بيطري- بيطار | Veterinary surgeon | "بەیتاڵ"، پزیشکی گیانەوەر، (ڤیترناری سیرجیون)، فاریەر. |
| بيطرة | Veterinary= Farriery= Veterinary medicine | پزیشکێتیی وولاخ، چارەکردنی گیاندار، چارەکردنی ئاژاڵ، بەیتاڵ خانە، پزیشك خانەی گیاندار. بەیتاڵی (فاریەری) (ڤیترناری مێدیسن). |
| بيظة | Spermule | (سپێرمیول) گەرای میروله و بۆق. |
| بيع | Selling | فرۆشتن، فرۆتن، (سێڵ). |
| بيع بالمزاد | To sell by auction | مازادکردن، مەزات کردن. |
| بيغوثية | | (بیگوتیا) جۆرێکە لە کەروو ڕەنگەکەی سپی یان زەردە. |
| بيغونية- بيطونية- اذن الفيل | Begonia | (بیگونیا)، گوێ فیل، گیایەکی دەشتەکی پزیشکی یە گوڵی سپی یان پەمەیی ئەگرێت. |
| بيفاترون | Bevatron | (بیڤاترۆن)، ئامرازێکە بۆ پترکردنی خێرایی تەنی پچووك. وەکو پرۆتۆنەکان. |
| بيقة- بيسقية | Common vetch | گیادانە، گینەدەڵ، میژورد، ڕووەکێکی گیاییە گوڵێکی بنەوشەیی دەگرێت، ئەروێنرێت و ئەکرێت بە ئالیك. (کۆمۆن ڤێچ). |
| بيقران | Dragons head | (دراگۆنس هێد) سەرە ئەژدیها، گیایەکە گوڵەکەی بنەوشەیی‌یە لە سەری ئاژدیها ئەچێت. |
| بيكربونات | Bicarbonate | (بیکاربۆنات) خوێیەکی هایدرۆجینی‌ی کاربۆنیك ئەسیدە. |
| بيكتات الكاليسيوم | Calcium pectate | (کالیسیوم) پیکتەیت ئاوێتەیەکە لە پەردەی ناوەڕاستی خانەکانی ڕووەکەدا هەیە. |
| بيكلاديت | | (باکیلات) مادەیەکی پلاستیکی‌یە، قەڵەم پاندان و تەلەفۆن و دەسکی چەتری لێ دروست دەکرێت. |
| بيكاسون- بكاسين- شنقب- شكب- بكاشين | Snipe | قورلویلە، قوڕاویلکە باڵندەیەکە بەقەدەر سویسکەیەك دەبێت دەنووك و قاچی درێژە (سنایپ). |
| بيكتين | Pectin | (پیکتین)، بریتی‌یە لە تێکەڵاوێك لە کاربۆهێدراتەکان، لە دیواری خانەی میوەو سەوزەواتدا هەیە، بە تایبەتی لە پەردەی ناوەڕاستی خانەکاندا. |
| بيكان | Pecan | (پیکان) گوێزی ئەمریکی، جۆرێکە لە درەختی گوێز. |
| بيكة | Pika | (پیکا)، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە کون و کەلەبەری ژێر زەوی دا ئەژی ڕەنگەکەی مەیلەو ڕەشە بەشەو ئەگەڕێت. لە کۆمەڵەی کەروێشکە. |
| بيلسان- بلسان- خمان- سبوقة- دمدمون | Elder | ڕووەکێکی جوانی پزیشکی‌یە، گوڵێکی سپی بۆن خۆش ئەگرێ، بەلەسان، "بەیلەسان"، ئێڵدەر، سامبوکەس. |
| بيلون | Billon | "١" جۆرە قوڕێکی مژۆکە بۆ تیمار کردنی برین بەکاردەهێنرێت، قوڕی مژۆك. "٢" (بیلون)، تێکەڵاوی زیو یان زێرلەگەڵ کانزایەکی هەرزان. |
| بيلم | Capsule of cotton | (قۆزاخەی لۆکە) (کاپسول ئۆف کۆتن). |

| | | |
|---|---|---|
| بيلون- قرفة بيضاء | White cinnamon | (وايت سينامون)، دارچينى سپى، ئەومنێكى بۆن خۆشى پزيشكىيە. |
| بيمالية | | (پيماليـا) كۆلـە برنـج، ئەومنێكـى ئەشـتەكىيە گوڵەكـەى بەشـێوەى هێشوويەكى پەمبەيى يان سپىيە. |
| بيمارستان- مستشفى المجانين | Mental hospital | شێتخانە، (مێنتال هۆسپيتاڵ). |
| بين- ظاهر | Visible | (ڤيزيبل) ديار، ئاشكرا. |
| بينة | Proof | بەڵگە، (پرووف) (ئيڤيدينْسى). |
| بينيث | Bonito | (بونيث) (بۆنيتۆ) جۆرە ماسىيەكى بێ پولەكەيە. |
| بينزاين- بنزين السيارات | Benzine | (بەنزاين) بەنزاينى ئوتومبيل، لە دڵۆپاندنى نەوتى سروشتى (پيترۆليۆم) ئەرئەهێنرێت، بۆ سووتەمەنى و پاك كردنەوە بەكارئەهێنرێ. |
| بينزين- بينزول | Benzene = benzol | (بينزين)، ئاوێتەيەكە لە كاربۆن و هێدرۆجين پێك هاتووە، لە پلەى (٨٠)ى سەدىدا ئەكوڵێ، شلەيەكى بێ رەنگە لە ئەلكولا ئەتوێتەوە لە ئاوا ناتوێتەوە، لە دڵۆپاندنى خەڵوزى بەردين ئەرئەهێنرێت، لە دروستكردنى بلاستيك و ئەسپريندا بەكار ئەهێنرێت. |
| بين | Between | نێوان، ناوەند، ناڤبەر. |
| بيهن | | (بورساريا)، رووەكێكە گەڵاكەى وورده. گەڵاكەى بە شێوەى هێشويەكى سپى بۆن خۆشە. |
| بيهدونال | | (بايهيدونال)، ئەرمانێكە رووەكى مشەخۆر قەلاچۆ ئەكات. |
| بيورية | Pyorrhea | (پايوريا) (بيۆرێ)، نەخۆشىيەكە تووشى ددان و پووك و دەمارى ددان ئەبێ. |
| بيوتان | Butane | (بيوتان) گازێكە لە (٤) كاربۆن و (١٠) ئەتۆم هايدرۆجين پێك هاتووە. بۆ دروست كردنى لاستيكى دەستكردبەكاردێت. |
| بيوتا | Biota | (بايوتا)، ژيانى گياندارو رووەك لە هەرێمێك يان لە كاتێكى تايبەتى دا. |
| بيولوجيا- علم الحياة | Biology | (بايولۆجى)، زانيارى زيندەوەر، زانيارى دەربارەى ژيان، "ژيان زانين". |
| بيوليب- بوليب | Polyp | (پوليپ) چەند شێوەيەكە لە گياندارى ئاوى ساكار وەكوو: شيلان. |
| بيوض | Oviparous | هێلكەكەر، (ئۆڤيبارەس). |
| بيوتادين | Butadiene | (بيوتـادين) گـازێكى ئۆرگانيكىيـە بـۆ دروسـتكردنى لاسـتيكى دەسـتكرد بەكارئەهێنرێت. |
| بيومترية | Biometry | (بايوميتـەرى) لقێكـە لـە زانيـارى ماتمـاتيكى سـەرژمێرى دانيشـتوان و چارەكردنى نەخۆش. |
| بيوت | | (پيوتل) گيايەكى پزيشكىيە گوڵەكەى سەوزى مەيلەو پەمبەيىيە |
| بييضة | Ovum | (ئۆڤەم) گەرا. |
| بيوضى | White heron | ئيگريت، شينە شاهۆى سپى. |

| | | |
|---|---|---|
| تابع | Following | (فۆلۆوینگ)، دوا ڕۆ، بەدوکەوتوو، پاشکۆ، لایەنگیر. |
| تابوت | Coffer= Coffin | (کۆفین) دارتەرم، دارەمەیت، دووداره، داربەستی. |
| تابیر- تابیروس | Tapir | (تاپیر)، گیاندارێکـە شـێوەیەکی سـەیری هەیـە، هـەندێ بەشـی لەشـی ڕەنگینە، لەگا گەورەترە و لە فیل بچوکترە، سم دارەو لووت و لێوی بووە بە لمۆزێك لەبەراز ئەچێت، لە ناوچە گەرمەکاندا ئەژی. |
| تابین | Evlogy | پیرەوەری مردوو، باس کردنی مردوو. |
| تابیوکا | Tapioca | (تاپیوکا)، ئاردێکە لە ڕەگی درەختی مانیوك دەرئەهێنرێت. |
| تابل- "توابل" | Spice | (کۆندیمێنت، سپایس، سیزنینگ) بەهارات، ئەو داوو دەرمانەیە کە بۆن و تامی خواردەمەنی خۆش ئەکات، چونکە ڕۆنێکی بۆن خۆشی تیایە وەك ئەعنا و مێخەك و زەعفەران و بیبەر و زەنجەفیل و زەردەچـەوەو سیر... بریتین لە ڕەگ یا قەد یا گەڵا یان بەرو تۆوی ڕووەك، ئەزبیە. |
| تابع- قمر تابع الى سیار | Satellite | (ستێتلیت)، مانگ، هـەیڤ، هـەر تـەنێکی ئاسمـانی بـەدەوری ئەستێرەیەکی گەرۆکی گەورە تردا بسوڕێتەوە. وەکوو مانگ بەدەوری زەوی دا. |
| تابیر | Pollination | (پۆلینیزێشن)، ئاووس کردن، چاك کردنی گوڵ. |
| تاتو- مدرع | Armadillo | (ئەرمادیللۆ)، گیاندارێکی زرێداری مێرووله خۆره. |
| تاثیر کهروضوئي | Photo electric effect | (فۆتۆئەلەکتریك ئیفیکت)، کاری فۆتۆ ئەلەکتریکی، هـەندێك کـانزا ووزەی تیشك هەڵ ئەمژن وە ئەلەکترۆنی ئازاد دەرئەپەڕێنن. |
| تاثیر | Effect | کار، کارلێکردن، "کارتێ کردن" زەبر، "شوێنکار" (ئیفیکت). |
| تاثیر کهربائی | Electric effect | "کارتێ کردنی کارەبایی، شوێنکاری کارەبایی" کاری کارەبایی. |
| تاثیر مغناطیسی للتیار الکهربائی | Mgentic effect | "شوێنکاری موگناتیسی تەووژمی کارەبایی". |
| تاثیر کیمیائي للتیار الکهربائي | Chemical effect | شوێنکاری کیمیایی‌ی تەوژمی کارەبایی. |
| تاثیر مکانیکی للتیار الکهربائی | Mechanical effect | شوێنکاری میکانیکی‌ی تەووژمی کارەبایی. |
| تاثیر ترمیونی | Thermionic effect | دەرپەڕینی ئەلەکترۆن لە تەنێکی گرگرتووەوە وەکوو لە تەلەباریکەکانی ناو گلۆپی کارەباوە (ثیرمیونیك ئیفیکت). |
| تاجر | Merchant | (میرچنت، تریدەر) بازرگان. |
| تاج | Crown | (کراون) پۆپیتە، برەك تاج، تاجە، پۆپە. |
| تاج السن | Cusp of tooth | (کەسپ ئۆف تووث)، تاجەی ددان. |
| تاجر جواهر | Merchant of Jewels | گەوهەر فرۆش، تیت. |
| تاجر الاغنام | Trader of sheep | جەڵەبچی، جەڵەوچی. |
| تاجر الخیول | Coper = trader of horses | جامباز. |
| تاجیر | To hire | بەکرێ دان. |
| تاجر الجملة | Wholesaler | جوملە فرۆش، (ۆڵ سێلەر). |
| تاحم | Weaver | (ویڤەر) جۆلا، |
| تاحی | Gardener | (گاردنەر) باخەوان. |
| تاخر | Lateness | (لیتنێس) دواکەوتن درەنگی. |

| | | |
|---|---|---|
| تادم | Puterfaction | (پوتريفيكێشن)، شی بوونەوەی مادەی نايترۆجينی بەكاری ميكرۆب. |
| تار | Juice | (جووسی)، كاكڵەی بەری ڕووەكێك كە ئاوكی زۆربێت. |
| تارب | Earth worm | (جيوفاگەس) كرمی گڵ خۆر. |
| تارة، مرة | Once | (وەنس) جار، ديسان. |
| تارتارخام | Argol | (ئەرگۆڵ) مادەيەكی كريستاڵی سوور يان خۆڵەمێشی‌يە لە بنی بەرميلی شەراب گرتنەوەدا ئەمێنێتەوە. |
| تاريخ، زمن | Date | (دێت)، ڕۆژ، ساڵ، دێرۆك. |
| تاريخ (علم) | History | (هيستری)، مێژوو. |
| تارجح | Swing | جولانەكردن، ديلانێ، شەكانەوە. |
| تارتارات | Tartarate | (تارتارەيت)، خوێی تارتاريك ئەسيد. |
| تارتارات الصوديوم البوتاسيوم | Sodium-Potassium-Tartarate | خوێی (ڕۆشێل)، سۆديۆم پۆتاسيۆم تارتارەيت. |
| تارزير | Tarsier | (تارسيس) گياندارێكی شيردەرە لە فلپين ئەژی بەقەدەر مشكێك ئەبێ لە مەيمون ئەچێت. |
| تاريخ الحياة | Biography | (بايۆگرافی). مێژووی ژيان. |
| تاريخ جيولوجي | Chronology | (كرونۆلۆجی) مێژووی جيۆلوجی، ڕێكخستنی بەسەرهاتی خرۆكی زەوی لە چاخ و سەدەكاندا لە مليۆنەها ساڵ لەمەوبەرەوە. |
| تاريخ نشوء الفرد | Autogeny | (ئۆتۆجينی)، مێژووی پەيدا بوونی زيندەوەر، هەموو پلەكانی گەورە بوونی زيندەوەر. |
| تاريخ نشوء النوع | Phylogeny | (فايلوجينی)، مێژووی پەيدا بوونی جۆر، مێژووی گۆڕانی (گەشە كردنی) جۆری زيندەوەر يان ڕەچەڵەك. |
| تآزر | Tosupport | هاوپشتی، يارمەتی دان. |
| تاسيس | Foundation | دامەزراندن، بناغەدانان. |
| تاسس | Institotion | دامەزراندن. |
| تاسع | Ninth | نۆيەم، نۆهەم. |
| تاسع عشر | Nine teen | نۆزدەيەم، نۆزدەهەم. |
| تاشق | Alkalinity | (ئەلكالينيتی)، قلْيەيی. |
| تاشين | | دەرهێنانی مادەی قلْيە لە خۆڵەمێشی قەوزە. |
| تاصل | Allotropy | (ئەلۆترۆپی) بوونی چەند شێوەيەك لە هەمان توخمی كيميايی وەكوو بوونی چەند شێوەيەك بۆ توخمی كاربۆن يان گۆگرد. |
| تاغندست- جاوی | | (فيلۆگراس)، ڕووەكێكی پزيشكی‌يە گوڵەكەی سپی و پچووكە ڕەگەكەی بۆ مەبەستی پزيشكی بەكاردێت. |
| تافة | Patiry | هيچ و پووچ، بێ نرخ. |
| تافول | Tacca | (تاكا) گيايەكی سەلك دارە سەلكەكەی مادەيەكی نشاستەيی خۆشی تيايە ئەخورێت. |
| تاق | | (ئەنافيلاكسس)، زۆری هەستايەتی. |
| تاقلم | Naturalition = adaption | (ئەكليميت)، ڕاهاتن لەسەر شوێنەوارێكی تر. |
| تاكاهي | | (تاكاهی) باڵندەيەكی نيوزيلەندی‌يە لە كۆمەڵەی مريشكی ئاوی. |

| | | |
|---|---|---|
| تاكل | Torot= Decay | داخوران، سووان خورەمان (خورەماو) داخوراندن، داڕوتان، داوەشان، کۆڕۆشن، داڕزانی مادە بەشێنەیی بەهۆی کارلێك کردنی کیمیایی‌یەوە. |
| تاكيد | Confirmation | پاڵشت دان، دووبارە کردن، دووپات کردن. |
| تاكسد | Oxidation | (ئوکسایدیشن)، ئۆکسید بوون، ژەنگ هەڵهێنان، یەك گرتنی مادە لەگەڵ ئۆکسجین. |
| تاكومتر | Tacometer | (تاکۆمیتەر)، دەزگایەکە بۆ پێوانی خێرایی سوڕانەوە بۆ نموونە: بۆ پێوانی خولانەوەی پێچکە. |
| تاكونيت | Taconite | (تاکۆنێت) بەردی ئاسن، جۆرە بەردێکە ئاسنی تیایە بەشێوەی ژەنگ. |
| تاكوت | Euphorbia | (یوفوربیا)، شیرمار، جۆرە ڕووەکێکە. |
| تالة | Transplant | خەڵف، نەمام، شەخەڵ، براله. |
| تالك | Powder | (تالك) (پاودەر) بۆدرە. |
| تالف | Damaged | (دامیجد) بەربادبوو، لەناوچوو، فەوتاو. |
| تاليف | Writing | (رایتینگ) دانان، دانانی کتێب، نوسین. |
| تالف | Unison | هۆگری، دەستەمۆیی، هۆگربوون. |
| تالم | Suffering pain | (سەفەرینگ پێن) ئازار خواردن، سوڵانەوە، ئێش. |
| تالق | Glitter | (گلیتەر) (شاین) "ك" درەوشانەوە، تەنێك ڕووناکی بداتەوە بەبێ ئەوەی کە پلەی گەرمی بەرزببێتەوە، وەکو ڕووناکی دانەوەی (فۆسفۆر) وە (فلۆری)، چرسنی. |
| تالق فوسفوري | Phosphorescence | (فۆسفۆریسینسی) درەوشانەوەی فۆسفۆری، جۆرە درەوشانەوەیەکە لە ئەنجامی هەڵ مژینی تیشکەوە دەبێت، وە هەتا ماوەیەك (لە دوای وەستانی هەڵ مژینەکە) بەردەوام دەبێت. |
| تال- دوم تدمر | Tal palm | (تال پالم) درەختێکە لە کۆمەڵەی خورما، گەڵاکەی وەك باوەشێن وایە، ئاوکێکی شیرین لە قەدەکەی دەرئەهێنرێت شەرابی لێ دروست ئەکرێت. |
| تالب | | درەختێکە تیروکەوانی لێ دروست ئەکرێت. |
| تالب | Ibex | (ئایبیکس)، بزنە کێوی. |
| تالينوم- هرجرج | Talinium | (تالینیوم)، گیایەکی دەشتەکی و کشتوکاڵی‌یە لە کوزەڵە ئەچێت گوڵی سپی یان سور ئەگرێت. |
| تاليوم-ثاليوم | Thaleum | (ثالیوم) توخمێکی کانزایی‌یە کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (٢٠٤) زۆر ڕەقە زوو ژەنگ هەڵ ئەهێنێت. ئاوێتەو خوێیەکانی ژەهرن. نیشانەکەی (Th). |
| تامول= تنبل= شاه- صيني= تانبول | Betel-peper | (بیتیل پێپەر) (تامول) ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی بیبەر گەڵاکەی ئەجوورێت بەرەکەی وەکوو گوێز وایە ڕەنگێکی سووری لێ دەرئەهێنرێت، دەرمانی پاکژکەرەوە لە گەڵاکەی ئەگیرێت. |
| تاميم | Nasionalisation | "خۆماڵی کردن"، خۆماڵی کردنی هەموو هۆیەکی بەرهەم هێنان وەکوو کومپانیا و کارگە و خانوو بەرە، کردنی خانوو بەرو کومپانیاو کارگە و هەموو هۆیەکی بەرهەم هێنان بە موڵکی میللەت، میلکی کردن. |
| تامل | Meditation | هیواداری، ئەندێشە، لێ وردبوونەوە. |
| تامين | Insurance | (ئینسورانس) مسۆگەرکردن. |
| تام | Complete | کۆك، (کۆمپلیت) تەواو. |
| تامينات | Security | (وارانتی)، پێشەکی بە پارە یان شتومەك. |

| | | |
|---|---|---|
| تامور- شغاف القلب | Pericardium | (پێریکاردیەم) پەردەی دڵ، پەردەیەکە دوو دیواری هەیە، وەك تورەکە وایە، دەوری دڵی داوە وە بەستراوە بە ناو پەنجەکەوە. |
| تامر- لوبیاء عسقولیة | French beanc | جۆرێکە لە لۆبیا ڕەگەکەی سەلك دارە دەنك و سەلکەکەی ئەخورێن. |
| تامیة- صید | Squirrel | گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە کۆمەڵەی سمۆرە، پێستەکەی زەردە هێڵی ڕەشی تیایە. |
| تانی | | |
| تانی | Slowness | لەسەرخۆیی، شێنەیی، هێواشی. |
| تانیب | Reprimand | سەرزەنشتی، پیاهەڵشاخان. |
| تانبول | Betel pepper | (بیتیل پیپەر) (تامول) ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی بیبەر گەڵاکەی وەك بنێشت ئەجوورێت. |
| تانریك | Tanrec | (تێنرێك) جۆرە گیاندارێکی مێش و مەگەز خۆرە و کلکی نییە. |
| تانتالم | Tantalum | (تانتالوم)، توخمێکی کیمیا گەرییە کێشی ئەتۆمییەکەی (٧٣)یە، کانزایەکی خۆڵەمێشییە ماناکەی لە وشەی (تانتالس) خوداوەندی گریکە کۆنەکانەوە وەرگیراوە، نیشانەکەی (Ta)یە. ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٧٣)ە، کێشی ئەتۆمییەکەی (١٨٠,٩)ە. |
| تانین | Tannin | (تانین)، ئاوێتەیەکی ئۆرگانیکیی سروشتییە لە کەڵوی بەڕوو و بەری مازوودا هەیە پێستەی پێ خۆشە ئەکرێت. |
| تاهل | To marry | ژن هێنان. |
| تاهیل | Inhabited | شیاندن، ماڵی کردن، ڕاهێنان. |
| تاوة | Groaning | (گرۆنینگ، مۆنینگ) ناڵە، ناڵین، ناڵاندن، هەناسە هەڵکێشان. |
| تاویل | Explanation | وەزرین، گۆڕین، لێك دانەوە. |
| تایید | Support | لاگیری. لایەن گیری، پشتیوانی کردن. |
| تایرا | | (تایرا) گیاندارێکە لە ژاڵ (قاقوم) ئەچێت. |
| تایر - إطار | Tyre | (تایەر) تایەی ئۆتۆمبیل. |
| تاین | Ionization | تایین (ئایۆنیزیشن) ئایۆنین، بوون بە ئایۆن، وون کردنی یان وەرگرتنی ئەلەکترۆن لەلایەن ئەتۆمی توخمێکەوە. |
| تاید | Tide | (تاید) تۆزی سابون. |
| تبادل غازی | Gasioos exchange | (تبادل الغازات) گۆڕینەوەی گاز، ئاڵو گۆڕی گازی، گۆڕینەوەی گازەکان، گازگۆڕینەوە (گازیەس ئێکسچێنج). |
| تبادل المنفعة | Service exchang | سوود گۆڕینەوە، گۆڕینەوەی سوود. |
| تباریح النبات | En flore scence | (ئینفلوریسینس) شکۆفەی گوڵ. |
| تبادل | Exchange | (ئێکسچێنج) ئاڵوگۆڕ، گۆڕینەوە، هاڵوگۆڕکردن، جێ گۆڕکێ. |
| تباح جبلی | | جۆرێکە لە ڕووەك. |
| تبال | Spice seller | بەهارات فرۆش. |
| تبان | Straw seller | (سترۆسێلەر) کافرۆش. |
| تباین | Difference | (دیفیرجێنس) جیاوازی. |
| تباهی | | خۆهەڵ کێشان، لاف لێدان. |
| تباین الخواص | Anisotropic | (ئەنیسۆترۆپی) ڕووداوێکە لە کریستاڵی مادەکان دا ئەبینرێت، جیاوازی سیفەتەکان. |

| | | |
|---|---|---|
| تبادل آيونى | Ion exchange | (ئايۆن ئێکسچێنج)، ئاڵو گۆڕی ئایۆنی، ئایۆن گۆڕینەوە. |
| تباعاً | Succesively | (سەکسێسیڤلی)، یەك لە دوای یەك. |
| تبجج | Vaunt | فیشاڵ کردن، خۆهەڵکێشان، لاف لێدان. |
| تبخير | Vaporization | (ڤاپوریزێشن) کردن بەهەڵم، بە هەڵم کردن، "هەڵماندن". |
| تبخر | Evaporation | (ئیڤاپۆریشن) بوون بە هەڵم، "بە هەڵم بوون، هەڵمین" گۆڕانی شلە بۆ هەڵم بە کاری گەرمی. |
| تبديل | Changing | (ڤارێشن) گۆڕین (چێنجینگ)، گۆڕینەوە، گۆڕان. |
| تبدد | To be scattered | لە ناوچوون. |
| تبدد الطاقة | Scattered of the energy | لەناو چوونی ووزە، گۆڕانی ووزەی میکانیکی بۆ گەرمی‌یەکی ئەوتۆ کە سوودی لێ وەرنەگیرێت. |
| تبديد | Dispersing | (دیسپێرسینگ) (سکاتەرینگ) لە ناوبردن، وون کردن. |
| تبرعم | Budding | (بەدینگ) گۆپکە کردن، چرۆکردن، خونچە کردن. |
| تبرز | Evacuate | (توئیڤاکیوت)، پیساسی کردن، دەرهاویشتنی پیسایی. |
| تبرع | Contribution | باربو، بەخشین. |
| تبريد | Cooling | (کوولینگ) ساردکردنەوە. |
| تبرم | To be annoyed | بێزاری، وەڕسی. |
| تبرقش | Different colours | ڕەنگاو ڕەنگ بوون "ڕەنگاو ڕەنگی". |
| تبريك | Congratulate | پیرۆزبایی. |
| تبرية | Discharge | پاکانەکردن، گەردن ئازادکردن. |
| تبرج | To bedeck | خۆڕازاندنەوە، ئارایشت کردن. |
| تبر | Ore | (ئۆر) کەرەسەی خاوی کانزا. |
| تبر | Gold oar | (گۆڵد)، (نێتیڤ گۆڵد)، (گۆڵد ئۆر)، ئاڵتون، زێڕ، تەڵا، زێڕی سروشتی. |
| تبرومة | Theobroma | (ثیبروما)، درەختێکی دەشتەکی و کشتوکاڵی‌یە تۆوەکەی مادەی کاکاوی لێ دەرئەهێنرێت. |
| تبسم | Smile | زەردەخەنە، "خەنینەوە"، خنانەوە، بزە، نەرمە پێکەنین، خەندە. |
| تبشير- صفارية | Oriole | (ئۆریول)، جۆرە باڵندەیەکە جوانە. |
| تبشع | Caster oil plant | (کاستەر ئۆیل پلانت)، گەرچەك. |
| تبعثر | To scalter | (دیسپێرشن)، پەرت، پرژاندن، بڵاوبوونەوە. |
| تبع | Dragon fly | ١-(دراگون فلای)، جۆرە مێرووییەکە لەشەکەی لوولەیی و باریك و ڕەنگینە، پوشکە بەقنگە ٢-چنگنە، پنت، حەمحەم. |
| تبغ | Tobacco | (تۆباکو)، (نیکوتیانا) تووتن، تەماکۆ، جۆرەکانی وەکوو سامسۆن، ڕەشۆکی، تەوەس، نێرگەلە. |
| تبغ النارجيلة- تبغ الغليون | Nargile tobacco | توتنی نێرگەلە، تەنبەکی. |
| تبغية | Petunia | (پێتونیا) جۆرێکە لە ڕووەك - گوڵێکی بۆنخۆشی هەمەڕەنگە. |
| تبقع- تبقع الاوراق | Leaf spot | بەڵەکی، (سپۆتس)، (لییف سپۆت) نەخۆشی پەیدا بوونی پەڵەی هەمە جۆرو هەمە ڕەنگ لەسەر گەڵاو بەری ڕووەك بەهۆی جۆرە کەڕوویەکی تایبەتی‌یەوە. |
| تبليل | To wet | تەڕ کردن، شێدارکردن. |

| | | |
|---|---|---|
| تبلل- إمتصاص | Adsorption | (ئەدسۆرپشن)، تەڕبوون، هەڵمژینی گاز لەلایەن مادەی ڕەقەوە وەکوو خەڵوز. |
| تبلمر | Polymerization | (پۆلیمەریزێشن)، پۆلیمەر کردن، یەك گرتنی چەند مولیکیولێك لە هەمان مادە بۆ دروست کردنی مادەیەکی تازە. |
| تبليغ | To inform | ڕاگەیاندن. |
| تبلور | Crystallization | (کریستلایزیشن)، بوون بە بلور، بوون بە کریستاڵ، چلورەبەستن، کریستاڵ بوون. |
| تبليط بالحجر | Paving | (پاڤینگ) بەرد ڕێژکردن. |
| تبليط | Flagging | داپۆشینی زەوی بەبەرد یان خشت یان قیر. |
| تبلدي- بوباب- باوباب | Baobab | (بوباب)، (مۆنکی برید)، نانی مەیمون، جۆرە درەختێکی مەزنی تەمەن درێژە، بەرەکەی بەقەدەر پرتەقاڵێك ئەبێت تامەکەی مزرە دەنکەکەی چەورە. |
| تبليد= تأقلم | To acclimatise | ناچارکردنی گیاندارو ڕووەك بۆ ژیان لە ئاوو هەوایەکی تازەدا. |
| تبن | Straw | (تیبین، ستڕۆ) کا، هەلیز، کاپۆل. |
| تبن مكة- اذخر | Camels hay | (کامێلس هەی) پووشی ووشتر، گیایەکە گەڵاکەی بۆن خۆشە وەکوو چایی بەکاردێت، بۆنی خۆشی لێ دەرئەهێنرێت. |
| تبوير | Tofallow | بەیارکردن، بەجێ هێشتنی زەوی بەپیت بە بەیاری (بێ کشتوکاڵ کردن) بۆ ماوەیەکی تایبەتی. |
| تبولة | | تەبولە، جۆرە خواردەمەنییەکە لە ووردە ساوەر و تەماتەو پیازو کەرەوزو مەعدەنوس و لیمۆی ترش و ڕۆن و زەیتون و ئالەت و خوێ دروست ئەکرێت. |
| تبوغ- تجرثم | Sporation | (سپۆرێشن)، پەیدابوونی سپۆر لەلایەن ڕووەکە کوڵ شارراوەکانەوە. |
| تبوع- تهوع | Vomit | (ڤۆمیت) دڵ تێك هەڵاتن. |
| تبيان- بيان | Declaration | (دیکلارێشن) ئاشکرا کردن، بڵاوکردنەوە، ڕوون کردنەوە، دیاربوون. |
| تبيعة- تبيع | Calf (one year) | گوێرەکەی یەك ساڵە. |
| تبييض | Bleaching | (بلیچینگ) سپی کردنەوە، سپی کاری. |
| تبييض بالجص | To plaster | سپی کاری بە گەچ. |
| تبيكة | | (فیلاکورا). جۆرێکە لە کەروو. |
| تبيوكة | Tapioca | (تاپیوکا) جۆرێکە لە خواردەمەنی لە ئاردی مانیوك دروست ئەکرێت. |
| تتابع | To follow in succession | یەك لەدوای یەك، بەرێز. |
| ترانيك - عنكبوت احمر | Red | (ترانیکەس) جاڵجاڵۆکەی سور، مێرووەیەکی زیان بەخشە ناووکی ڕووەك هەڵئەمژێت. |
| تتبع- ملاحقة | Pursuance | شوێن کەوتن، لە دووگەڕان. |
| تتريب | Earth work | (ئێرث وۆرك) گواستنەوەی گڵی بە پیت بۆ زەوی بۆ مەبەستی بە پیت کردن. |
| تتفل | | شانەی گورگ، ڕووەکێکە لقەکەی لە پەنجەی دەست ئەچێت. |
| تتر | Tartars | (تارتارس) تاتار، میلەتێکە لە نێوانی چین و دەریای خەزەردا. |
| تتك | Triger | (ترایجەر) پەلەپیتکە. |
| تتمة= تكملة | Complement | (کۆمپلیمێنت) تەواوکەر، دوایی، کۆتایی. |
| تتن | Tobacco | (تۆباکۆ) تووتن. |

| | | |
|---|---|---|
| تتنوس، كزاز | Telanus | (تیتانوس) دەردەکۆیان، نەخۆشی‌یەکی درمە لە کۆئەندامی دەماریدا، گوێ ڕەپە. |
| تثاؤب | Yawing | (یاون) (یاونینگ) باویشک، باوێشک دان، ئاژاژک، ئازووشک. |
| تثبت- تحقق | Ascertaining | جێ گیربوون چەسپان، دڵنیابوون. |
| تثبيت | Fixing | (فیکسینگ، کۆنفیرمێشن) جێگیرکردن، چەسپاندن، ڕاگیرکردن. |
| تثبيط | Discouraging | دواخستن، تەگەرە تێ خستن. |
| تثفل | Fox cub | (فۆکس کەب) بێچووە ڕێوی. |
| تثقيف | Education | ڕۆشن بیرکردن. |
| تثقيب | Perforating | کون کردن، سمین، سمتن، قولیرکردن. |
| تثليث | Trisection | (ترایسێکشن) سیانە کردن، کردن بە سیان. |
| تثمين | Valuation | (ڤالیووێشن) قرساندن، نرخ پێدان. |
| تثنية | Folding | دوانە کردن، کردن بە دوان - قەدکردن. |
| تثول | Swarming time | (سوارنینگ تایم) کۆبونەوەی هەنگ لە دەمی کورەکەدا بەر لە بڵاوبوونەوەیان. |
| تجارة | Trade | (ترید) بازرگانی، کڕین و فرۆشتن بۆ مەبەستی قازانج. |
| تجاذب | Gravitation | (گراڤیتێیشن) یەکتر ڕاکێشان، یەکتر کێش کردن، هێزی یەکتر ڕاکێشانی نێوانی هەموو تەنەکان. |
| تجاري | Commerical | هەرەمە، شتی ڕەشۆکی، بازرگانی‌ی. |
| تجارة الخيل- جنبزة- نخاسة | Horse dealing | (هۆرس دیلینگ) جامبازی‌ی کڕین و فرۆشتنی وڵاخ. |
| تجبير | To repair | گرتنەوە، پێکەوەنان. |
| تجبير العظام | To set broken bones | ئێسک گرتنەوە، ئێسقان گرتنەوە، ئێسک بەند کردن، تەتەر پێچ. |
| تجبين | To curdle | بەپەنیر کردن، ئەوەیە کە نوێشک بکرێتە شیرەوە بۆ ئەوەی بکرێت بە پەنیر. |
| تجديد | Renewal = renovation | نوێ کردنەوە، تازە کردنەوە. |
| تجدد | Renewal = renovation | نوێ بوونەوە، تازەبوونەوە. |
| تجديف- تجذيف | Drowing | سەوڵ لێدان. |
| تجذير | Extraction= evolution | (ئێکستراکشن) ڕەگ دەرهێنان، دەرهێنانی ڕەگ بۆ ژمارەیەک. |
| تجربة | Experment | (ئێکسپیرمێنت) تاقی کردنەوە. |
| تجرد | To bedevoid | تەنهایی، سەڵتی. |
| تجريبي | Experimental | "بۆ تاقی کردنەوە" تاقی کردنەوەیی. |
| تجنيد | Reeruiting | سەربازگری. |
| تجزؤ | To devide | بەش بەش بوون، پارچە پارچە بوون. |
| تجزؤ العقل | Schisophrenia | (شایزۆفرینیا) پارچە پارچە بوونی فرمانی مێشک، جۆرێکە لە شێتی ئەو کەسە دوو شەخسیەتی هەبێت. |
| تجزئة | Division | کەرت کردن، پارچە پارچە کردن، بەش کردن. |
| تجسيم | Sterometry | (سیترۆمێتری) تەندار کردن، پێوانی تەنەئاسمانی‌یەکان. |
| تجشؤ | Belching | قرخێنە، قرقێنە، قورقێنە. |
| تجصيص | Plastering | (پلاستەرینگ) گەچ کاری، سپی کاری. |
| تجعد | Wrinckle | چرچ و لۆچی، چاڵ و چۆڵی، پێچ و پەنا، چرچ بوون، چرچی، هەڵقرچان. لوولی. |
| تجفيف- تيبيس | Drying = to dry | (درایینگ) ووشک کردن، ووشک کردنەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| تجفيف صناعي | Artificial drying | ووشك كردنەوەی دەستكرد. |
| تجليل | | (ئیفۆلێنج) قرتاندنی سەری گوڵی ڕووەك بۆ مەبەستی بەهێز كردن. |
| تجليد الكتاب= تجليد | Book binding | جزوبەند كردن، بەرگ تێ گرتن. |
| تجلبن = داء الجلبان | Lathyrism | (لاثیریزم)، ژەهراوی بوونی ئاژەڵ لە ئەنجامی زۆر خواردنی ڕووەكی گاڵەوە. |
| تجلية | Clearing | ئاشكراكردن. |
| تجميل | To beautify | جوان كردن، ڕازاندنەوە، ئاڕایش كردن. |
| تجمد | To freeze | بەستن، گۆڕانی مادەی لە باری شلییەوە بۆ باری ڕەق. |
| تجمع الدم | | خوێن تێ زایین، تێ زایینی خوێن. |
| تجمهر | To Throng | تێ ووروكان، جەنجاڵ، كەلەكۆمەكێ، كۆمەڵ بوون. |
| تجمع | To be gathered | كۆبوونەوە، مۆڵ خواردن. |
| تجنب | To avoid | دووركەوتنەوە، خۆدوورخستنەوە، دوور بوون، خۆلادان. |
| تجنس | | ڕەگەزگری |
| تجنيس | Naturaliztion | ڕەگەزگری كردن. |
| تجنن | To become mad | شێت بوون. |
| تجنيد | Recruiting | سەربازگرتن. |
| تجويف | Cavity recruiting | (كاڤیتی)، بۆشایی. |
| تجول | Wander about | گەڕان. |
| تجوية | Weathering | (وێزەرینگ) كەشاندن - ووردو خاش بوونی بەرد لە ئەنجامی كشان و كرژبوونەوە بە هۆی گۆڕانی پلەی گەرمی و زوقم و ئاوو سەهۆڵ و ڕەشەباوە. |
| تجويف حقي | Acetabular fossa | بۆشاییەكە لە ئێسقانی سێ بەندەدا سەری ئێسقانی ڕانی تێ چووە. |
| تجهم | To frowm | مۆڕبوونەوە، ڕووگرژكردن. |
| تجهيز | To get ready | ڕەخت كردن، "تێشوو پی دان، باربوكردن"، سازو ئامادە كردن. |
| تجهيزات | Preparation | ترۆتفاق، كەل و پەل، كەرەسە، تێشواك، شتومەك. |
| تحافى | Antiquity | عەنتیكەچی. |
| تحات | Erosion | (ئیرۆشن) ڕامالین، ڕامالینی بەرد و خۆڵ لەسەر ڕووی زەوی بە كاری ئاو و باران و بەفر. |
| تحاريف- بروض | Low water mark | (لۆ ووتەر مارك)، نزمترین ئاقاری ئاو. |
| تحاشى | Except | دووركەوتنەوە، خۆ دوورخستنەوە. |
| تحتانى | Lower | ژێرەوە. |
| تحت الأبط | Under armpit | بن باڵ، بن دەست، بن باخەڵ. |
| تحت السرة | Under navel | بەرموسڵدان، بەرموسڵلان. |
| تحت الركبة | Under knee | ژێر ئەژنۆ، بن ئەژنۆ، بن هەنگڵ. |
| تحت | Under | (ئەندەر)، (بیلۆ)، لەبن. |
| تحتت | Crumblings | (كرەمبلینگ)، ووردو خاش بوون. |
| تحتيات الهدب | Hypotrichia | (هیپوتریكیا) كۆمەڵە گیاندارێكی سەرەتایین برژۆڵەكانیان لە ژێرەوەیە. |
| تحجر | Petrifaction | (پێتریفیكێشن) بوون بە بەرد، گۆڕانی مادەی نەرمی لەشی گیاندارو ڕووەكی مردوو بۆ مادەیەكی كانزایی ڕەق لە ژێر زەوی دا. |

| | | |
|---|---|---|
| تحجيل | White foot | پەڵەی سپی لە پەلی ئەسپ دا. |
| تحجين | Bending | (ئەرکینگ) چەمانەوە. |
| تحدب | Convexity | قۆقزی، قۆقزبوون، قۆقزایی. |
| تحديق | To look fixed | چاوتێ برین، چاو زەق کردنەوە. |
| تحديد الصلاحية | Limitation of efficiency | "سنووری دەسەلات"، دیاری کردنی دەسەلات. |
| تحديد | Limittion | سنووردانان، برینەوە، شوورەدانان. |
| تحديد النسل | To limit progeny | سنوور دانان بۆ زاوزێ، بەربەست کردنی وەچە، سنوور کێشانی وەچە. |
| تحديل- تمليس | Rolling | (رۆڵینگ) گێران، تەخت کردن وەکوو بەباگردێن. |
| تحدي | To challenge | بەرەنگاربوون. |
| تحذير | Warning | ووریا کردنەوە. |
| تحريك | Moving | جوولاندن، تەکاندان، جماندن، بزواندن. |
| تحري | Pursus | پشکنین، لێکۆڵینەوە، بەشوێندا گەران، گەران بە شوێندا. |
| تحرير | Editing = freeing = releasing | نووسین، ئازاد کردن، رزگارکردن، بەرەڵا کردن. |
| تحرش | To meddle | شەڕ فرۆشتن، تێ‌بەربوون. |
| تحريض | Provoking | فیت دان، کاڵ دان، هان دان، هەڵ فریواندن. |
| تحسين- تحسينات | Improvement | (ئیمپرووڤمێنت) چاك کردن. |
| تحسين النوع | | چاك کردنی جۆر. |
| تحسين النسل | Aristogensis | (یوجینا)، چاك کردنی وەچە، زۆرکردنی وەچەیەکی باش لە گیاندارو رووەك بۆ مەبەستی ئابووری. |
| تحسير | Moulting | (مازڵتینگ) پەڕ فرێدان، لە باڵندەدا بۆ تازە کردنەوەی. |
| تحسن | To get better | جوان بوون، رازاندنەوە. |
| تحشد | To accumulate | کۆمەڵە بەستن، گەلە کۆمەکردن، رێچکە بەستن مۆڵ خواردن. |
| تحصيب | Macadamise | چەورپێزکردن، بەرد رێژکردن. |
| تحصيل | Acquiring | هێنانەدەست، دەست گیرکردن. |
| تحصين | Fortification | سەنگەردانان. |
| تحضير | Preparing | ئامادەکردن، سازکردن، سازاندن. |
| تحطيم | To break up | (پەرچقاندن) تێك شکاندن، ووردوخاش کردن. |
| تحفة | Rarity | (رێرتی) نایاب، شتێکی بە نرخ، ئەنتیکە، عەنتیکە. |
| تحفيض | Drainage | (درێنێج) دەرکردنی ئاوی زیادە لە زەوی‌ی کشتوکاڵ. |
| تحقيق | Inuestigation· | پەیجۆر، هێنانەدی، ساغ کردنەوە، پاسادان، کۆڵینەوە، وەدی هێنان، توژینەوە. |
| تحكيم | Anbitrator | (بەرەڤانی) پشك نان. |
| تحكم | Arbitration | دەست بەسەراگرتن. |
| تحمل | Bearing | خۆگرتن، بەرگەگرتن. |
| تحميل | Carrying | بارکردن، خستنە سەر. |
| تحليل | Analysis | (ئەنالایەسس) شی کردنەوە، شیتەڵ کردن. |
| تحليل القوة | Force analysis | شی کردنەوەی هێز. |
| تحلل الغذاء | Food analysis | شی‌بوونەوەی خواردەمەنی، رزینی خواردەمەنی. |

| | | |
|---|---|---|
| جمرة اللسان الخبيثة | Glossanthrax | ئاگرەی زیان، نەخۆشی‌یەکی درمی گوشندەیە بۆ ئاژەل. |
| جمرة، جمرة نارية | Embers, Brand fire | پشکۆ، ئەسکل، سکل، پەنگر، بەرەنگ، پۆل، پەل. |
| جمرة عرضية | brand blacK-leg | لاقەرەشە، دوان خفیك، لارەشە ، نەخۆشی‌یەکە دەدات لە لاقی ئاژەل. |
| اوش، ابو ذراع ،جمرة ابو زرير، سواد الساق | Quarter-evil, Symptomatic an thrax | نەخۆشی‌یەکی درمە لە مانگادا بلاو دەبێتەوە. |
| جمرة، دمل، فرخ جمل | Carbuncle | شێرپەنجە، دوومەل. |
| جمرك، كمرك، مكس | Custom-house | گومرگ، بارانە. |
| جمز | Running | خێراڕۆیشتن، راکردن. |
| جمز بوكة، مارية | Antelope | کێوبی. |
| جمس، جموس | Hardening, Stiffening Callosity | رەق بوون، ئەستووربوون. |
| جمشت، جمست، ياقوت جمري | Amethyst, Cornelian-Stone | جەمەست، کەرکەهان، بەردی کۆرنیلیان، جەمشت جۆرێکە لە بەردی کوارتز رەنگەکەی شینی مەیلەو بنەوشەییە بەردێکی نیمچە بە نرخە. |
| جمع | Gathering ,Addition | کۆکردنەوە،گردکردنەوە. |
| جمع اليد، جمع الكف، قبضة | Fist | مستەکۆلە، مست، مشت. |
| جمعر | Clayish-marl | گلەزەردە، گلێکی زەردە. |
| جمعية | Society | کۆمەل، کۆمەلە، جڤات. |
| جمعية خيرية | Benevolent- Society | کۆمەلی چاکەکردن. |
| جمعية تشريعية | Legislative assembly | کۆمەلەی یاسادانان. |
| جمعية تعاونية | Freindly-benefit- Society | کۆمەلی هەرەوەزی. |
| جمعية تعاونية زراعية | Agricultural co-operative | کۆمەلەی هەرەوەزیی کشتوکالی. |
| جمعة، يوم الجمعة | Friday | هەینی، ئەینی |
| جمكية، راتب | Salary, Allowance | مانگانە، مەعاش، مووچە. |
| جملكة، صمغ اللك | Lacquer LacKer, Lac, Shellac, Gum-lac | لۆك، زەمقی لۆك، کەتیرەی لۆك، جۆرە زەمقێکە لە لایەن هەندێك درەخت یان مێرووەوە دەردەهێنرێت. |
| جملون، جمالون، سقف الجملون | Gable, Span-roof | جەمەلۆن، جەمالۆن، جۆرێکە لە سەربان. |
| جمل، بعير، ابو ايوب | Camel | حوشتر، وشتر، دەڤە، ئاروانە، ئارڤانە. |
| جمل البحر، كبع | Megaptera, HumpbacK-Whale | (میگاپتیرا)، (بالین) وشتری دەریا نەهەنگێکی پشت کۆمە، پەرەکەیەك وا بە پشتییەوە لە دووگ دەچێت. |
| جملة | Wholly | گردە، گەلەوتە. |
| جملة المبلغ | Total, Sum | مایەو سوود، فرومایە، خایەو مایە. |
| جملة عصبية | Nervous-System | هەموو پێکهاتنو فرمانێکی دەماریی. |
| جمل ذو سنام، جمل عربي، . حمل وحيد السنام | Dromedary, Arabian-Camel | وشتری یەك دووگ، وشتری عەرەبیی. |

| | | |
|---|---|---|
| جمل ذو سنامين، قرعوس، فالج، فلج، جمل قرملي، دهانج، دهامج قرعوش | Bactrian-Camel-Humped-Camel | وشتری دوو دووگ. |
| جملة (في التجارة) | Whole Sale | به کۆمەڵ، سەرجەم تێکڕایی، سەروبەر. |
| جمل الماء، بجع | Pelican | سەقاقوش، باڵندەیەکی ئاویی گەورەیە دەنووکی پانو درێژە لەژێر ملیدا تورەکەیەك هەیە ماسیی تیا کۆدەکاتەوە بۆ خواردن. |
| جمل اليهود، حرباء | Chameleon | خۆرپەرست، تیر تیرە، جۆرێکە لە مارمێلکە، رەنگەکەی بە پێی شوێن دەگۆڕێت لەسەر درەخت دەژی. |
| جمل امريكي، لامة، لاما | Llama | (لاما)، وشتری ئەمریکی بچووکترە و دووگی نییە. |
| جملانة، دخلة شائعة | White throat | قورگ سپیی، بەرسنگ سپی، جۆرێکە لە چۆلەکە. |
| جملج، جملوج، راس الهر | Galeopsis | (گالیۆپسیس)، گیایەکە گوڵی سپی دەگرێت. |
| جملونيات الأجنحة | Trichoptera | (تریکوپتیرا)، باڵ جەمەلۆنیەکان، جۆرێکە لە مێروو باڵیان وەکوو جەمەلۆن رادەگرن. |
| جم | Anomie | (ئەنومی)، گیاندارێکی دەریاییە لە کۆمەڵەی لەپکە واتە گوێچکە ماسیی. |
| جم | Plenty | زۆر، فرە. |
| جم، جمنازي | Gymnast | (جیمناست)، جومناس، پسپۆر لە وەرزشی جومناستیکدا. |
| جمناستيك، جمنازية | Gymnastics | جومناستیك، جوملاستیك، هەموو جۆرە یارییەکی وەرزش بۆ بەهێزکردنی لەش. |
| جمن،قتير، مسمار بطاسة | Stud | بزماری چەتریی کلیبس. |
| جمود، انجماد | Freezing | بەستن، بوونەسەهۆڵ، قەرسین، رچیان. |
| جمود، عدم حركة | Incation, Solidity | ١-بێ جووڵە، بێ جمە. |
| جموش، جميش، مزية الشعر، نورة | Coagulation Depilatory | ٢-بەستن، رەق بوون. داروو، دارووی گەرماو، دەرمانی لابردن. |
| جموح، شموس | Pestive,Unruly | سەرکێش، خورت، سرك، سەرهشك، سەر زەق. |
| جمهور | Crowd | جەماوەر، خەڵك، کۆمەڵە، کۆمەڵێك لە کەسانی گەل، هەزار زیلە. |
| جمهرة | Population | کۆبوونەوە، جەنجاڵ، تێ وروکان، کۆمەڵ بەستن. |
| جمهورية | Republic | کۆمـار، ئەو دەوڵەتانـەن کـە سـەرەك کۆمـار هـەڵدەبژێرن بـۆ ماوەیـەکی تایبەتیی. |
| جميز، تين فرعون، سقوم، سوقم | Sycamore-Fig, Mulbery-fig, pharaos fig | هەنجیری فیرعەون، هەنجیری توو، هەنجیری سایکامور، هەنجیرە سـوورە درەختێکـە لـە کۆمەڵـەی تـوو بەرەکـەی لـە هـەنجیر دەچێـتو دەخورێـت، تەمەنی درێژە، تەختەکەی بەنرخەو بەرەکەی بچووکەو بە لقەکانیەوە نیە بەڵکو بە قەدەکەیەوە. |
| جميل، جملان، بلبل، كعيت | Beautiful Bulbul | جوان، قەشەنگ، شۆخ، شەنگ، قۆز، نەشمیل، قازاخ، بەدەو باڵندەیەکی بچووکی دەنگ خۆشە. |
| جميع | Every.The-Whole-of | هەموو، گشت، سەراپا، سەرپاك. |
| جمي، فول | Broad bean | پاقلە. |
| جميسة | Jamesia | (جامیسیا)، دەوەنێکە گوڵەکەی سپیی و بۆن خۆشە. |
| جن | Flowers | شکۆفەو گوڵی رووەك. |

| | | |
|---|---|---|
| جناء احمر، قطلب شائع، مصير الدب | Common-arbute, Straw-berry | (ئەربیوت)، جۆرە ڕووەکێکە گوڵەکەی پەمبەیی بەرەکەی لە شلیك دەچێت، ئەرخەوانییە. |
| جنازة | Funeral, Bier | تەرم، چەمەر، جەندەك. |
| جناز، دلب شرقي | Funeral, Bier Oriental-plane- tree | سوورە چنار، درەختێکی مەزنە گەڵاکەی لە گەڵا مێو دەچێت لە قەراغ ئاوو جۆگاکان دەروێت. |
| جناَحية | Samara | (سامارا)، هەر بەرێکی وشکی یەك دەنکی توێکڵەکەی لە شێوەی باڵدا بێت وەکوو بەری زمانە چۆلەکەو دارەرمش. |
| جنان، ذات الجنب، داء الصناديد | Pleurisy | ئاوسانی پەردەی سیی، برك، سینەپاڵوو، ئاو کۆکەو کزانەوەی لە گەڵدایە. |
| جناية | Perpetration | تاوانی گەورە، کەتن. |
| جناح،جنح، سقط، روشن | Wing, pter, Ala | باڵ، شەپەر، شەقەل. |
| جناحي | Alar, Alary | باڵیی، واتا لەشێوەی باڵدا. |
| جناح، اثم | Sin, guilt | گوناه، تاوان. |
| جناح، جدادة | Pterois | (پتیرۆیس)، جۆرە ماسییەکی دەریایی ژەهریی درکاوییە، بەسەر ئاودا باز دەدات، وەکوو بفڕێت وایە. |
| جناح رومي، راسي | Elecampane | (ئیلیکامپێن)، باڵی ڕوومیی، گیایەکە گوڵەکەی زەردە. |
| جنائني | Gardner | باخەوان، ڕەزڤان. |
| جنان، ترس | Shield | زرێ، قەڵغان. |
| جناسة، عكامة | Homogamy | (هۆموگامی)، پیتێن، واتا جووت گرتن، لەنێوانی ئەو توخمە زگماکیانەی کە لە یەك ڕەسەن بن. |
| جنب | Side | تەنیشت،لا، تەك، ڕۆخ. |
| جنب | FlanK | کەلەکە،لا،ئاوقەد، لاقەد. |
| جنبد، جنبذ | Prophets flower Garden rose | گوڵەباخ،گوڵ محەمەد، گوڵەباخی سوور. |
| جنبد رقي | Parathyroid | (پاراسایرۆید)، تەنیشت، سایرۆید، پەیوەندی هەیە بەو چوار لوە (گلاندە) گەرانەوە(کوێرانەوە) کە نزیکن لە لوی سایرۆیدەوە لە ملدا. |
| جنبر، جنبار، حبرور | Young bustard | بەچکەی چێرگ. |
| جنبة | Shrub | دەوەن،واتا ڕوەکێك لەنێوانی گیاو درەختدا بێت. |
| جنبة، بلورا | Pleura | پەردەی سییەکان. |
| جنبوزة، تفاح الورد، خوخ، ملابار | Rose apple, Jambosier | (جامبۆسا)، سێوە گوڵ، دەوەنێکە بەرەکەی لە سێو دەچێت سوورو خۆشە دەخورێت. |
| جنبة عطرة، ديوسمة | Diosma | (دیۆسما)، دەوەنە بۆن خۆش، دەوەنێکە گەڵاکەی بۆن خۆشە،گوڵی سپیو پەمبەیی هەیە. |
| جنبري، روبيان | Prawn, Shrimp | ڕۆبیان، کوللەی ئاویی. |
| جنباز | Horse-Dealer, Jobber | بازرگان، یان دەڵاڵی وڵاخ، جامبازی وڵاخ. |
| جنبة، الدر، سمفورين | Snow berry | تووی بەفر، تووی مۆم، دەوەنێکە گوڵەکەی سپی یان پەمبەیی بەرەکەی خڕو گۆشتنە. |
| جنبة الرباط، افلوس | Wayfaring-tree | دەوەنێکە گوڵەکەی بەشێوەی هێشوە. |
| جنبخة | Great-lice | ئەسپێی گەورە. |
| جنة، فردوس | Paradise | بەهەشت. |

| | | |
|---|---|---|
| جنة، برتقال، برتقان، بردقان | Orange | پرتەقاڵ. |
| جنث، جذر وتدي | Tap-root | رەگی مێخیی، رەگی سەرەکی درەخت. |
| جنجن | Sternum,Carina | ئێسقانی سنگ، کۆڵەی سنگ، پەراسوبەند. |
| جنجل، حشيشة الدينار | Hop, Bine | مارچێوە، روەکێکە گوڵەکەی دەکرێتە بیرەوەبۆ ئەوەی تاڵو بۆنخۆشی بکات، گیایەکی بەرزە، قەدەکەی مووی پێوەیە، گوڵەکەی زەردە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| جنجر، بطباط | Armstrong, Knot-grass Knot-weed | (ئەرمسترۆنگ)، گیاگرێ، گیایەکی دەشتەکییە قەدەکەی لقی زۆری لێ دەبێتەوە لقەکانی راکشاون گوڵی سپی یان پەمبەیی بچووك دەگرێت، دەکرێت بە نوێنەمەك. |
| جنحة، اثم | Sin. Guilt | گوناه. |
| جندل العربات | Draft-horse | بارگیر. |
| جندب، جراد، نطاط، قبوط | Grasshopper, Locust | کولله،ریزویزە، کولۆ. |
| جندخ | Decticus | (دیکتیکەس)، جۆرێکە لە کولله. |
| جندرة، مصقلة، مكواة الورق | Mangle, Calender | سافکردنی کاغەز. |
| جندع | TicK | جۆرێکە لە گەنە بەسەر پشتی مارمێلکەوە دەبێت. |
| جندبيستر، بيدستر، جندباستر، سكلابي، قسطوريوم، قسطورة، قسطوريون | Castoreum | (کاسووریوم)، سەگلاوی، مادەیەکی چەوری تاڵی زەردی پزیشکییە لە تورەکەی ژێر گونی نێوانی هەردوو رانی گیانداری سەگلاو دەردەهێنرێت بۆ دروست کردنی عەتر. |
| جندم،كندم، غرثينية، جوزجندم | Garcinia, Mangosteen Gamboge tree | (گارسینیا)، درەختێکە قەدەکەی ئاوگێکی زەمقی لینجی لێ دەردەهێنرێت، بەرەکەی بە قەدەر سێوێك دەبێت، سوورو بۆنخۆشە دەخورێت. |
| جندل، جندل، شلال | Large stone, Waterfall, Cataract | بەردێکی گەورە، بەردێکی سەخت، تاڤگە. |
| جندوفلي، محار | Oyster | لەپکە، گوێچکە ماسی. |
| جندي، عسكر | Soldier | سەرباز. |
| جنرال | General | جەنەراڵ، سەردار. |
| جنريك | Pium | جۆرێکە لە قۆخ یان هەڵووژە. |
| جنز | Mud- hut | قۆختەی قوڕ، قۆختەیەکی بچووك، لە قوڕ دروست کرابێت. |
| خنزير سلسلة | Chain | زنجیر. |
| جنزبيل، زنجبيل | Ginger | زەنجەفیل، رووەکێکە قەدی ژێر زەوی هەیە بەشێوەی بەهارات بەکاردێت. |
| جنزار، زنجار | Verdigris | ژەنگی مس. |
| جنس | Sex | زایەندە،رەگەز نێر بێت یان مێ. |
| جنس | Genus | رەگەز، پلەیەکە لە پلەکانی پۆلکردنی گیاندارو روەك بریتیە لە کۆمەڵێك کە نزیکن لە هەندێك سیفەتدا. |
| جنسة | Ginseng | (جینسینگ)، جۆرە گیایەکە لە چین دەروێت، رەگەکەی تاڵو بۆنخۆشە. |
| جنس لطيف | Fair sex, Gentle sex | زایەندەی جوان، رەگەزی جوان، ئافرەت. |

| | | |
|---|---|---|
| جنس بشري | Human race, ManKind | رەگەزی مرۆڤ، رەگەزی ئادەمیزاد. |
| جنس، (علم الأجتماع) | Race | رەسەن، رەگ، رەگەز. |
| جنسان متداخلان، خنثى | Hermaphrodite | نێرەمووك، هەر گیاندارێك ئەندامی نێرو ئەندامی مێی لە هەمان كاتدا هەبێت. |
| جنسية، قومية | Nationality | ناسنامە، هۆزێتی، رەگەزێتی. |
| جنسن | Asiatic-ginseng | (ئەسیاتیك)، (جینسینگ)، رووەكێكی كشتوكاڵیی پزیشكی‌یە لە كۆمەڵەی لاو لاو لە چین دەروێت. |
| جنسي | Generic, Sexual | رەگەزیی، زایەندەیی. |
| جنستا الصباغين | Genista-tinctoria | جنستای رەنگ، گیایەكە گوڵەكەی زەردە بۆ مەبەستی پزیشكیی بەكاردێت. |
| جنطة، حقيبة | Bag hand-bag | جانتا، باوڵ، تۆربە. |
| جنطيان، جنطيانة، كوشاد، العشبة المرة | Gentian | مامیران، گوشاد، گیاتاڵە، جۆرە گیایەكی كێوییە گوڵێكی شین دەگرێت بۆ دروستكردنی مەی بەكاردێت، هەروەها دەرمانی چارەكردنی گیانداری لێ دەردەهێنرێت. |
| جنفاص، جنفيص، خيش | Canvas, Coarse-linen | گوێنیی، جانفاس. |
| جنق | Throwing | هاویشتن، هاڤێتن، فڕێدان. |
| جنقلة، دنقلة | Dipper, Water-ousel | (دیپەر)، باڵندەیەكی بچووكی ئاوییە لە كۆمەڵەی مریشكی ئاویی بە قەدەر بولبولێك دەبێت سنگی سپییە، سنگی رەشە. |
| جنكونا،كينا | Cinchona | (سینكۆنا)، توێكڵی درەختی سینكۆنا، توێكڵی درەختی سینكۆنا، قەنەقینە، گەنەگەنە، دەرمانی لێ دەردەهێنرێت بۆ چارەكردنی لەرزو تا. |
| جنكة، جينكو | JingKo, GingKo | (جنكۆ)، درەختێكە لە كۆمەڵەی سنەوبەر بۆ رازاندنەوەی باخچەكان باشە گەڵاكەی لە باوەشێن دەچێت بەرەكەی زەردە لە بادەم دەچێت. |
| جنك | | ئامرازێكی مۆسیقایە ژێی هەیە بە دەست لێ دەدرێت. |
| جنكة، جنك، طائر الثلج | Snow-bird | چۆلەكەی ئەمریكیی، باڵندەی بەفر، چۆلەكەیەكی خۆڵەمێشیی كۆچكەرە. |
| جنكو | Galvanised-iron | چینكۆ، لەوحی ئاسن یان پۆڵا كە بە چینێكی تەنك لە توتیا روكەش كرابێت دژی ژەنگ. |
| جن | Gin | جن، جۆرێكە لە مەشروباتی ئەلكهولی. |
| جن، جان | Demon, Jinnee | جنۆكە، شەولەبان. |
| جنهي، خيزران | Bamboo | حەیزەران، جۆرە درەختێكە لە قامیش دەچێت. |
| جنون، خبل | Insanity, Madness, Mania, Echea, Aballenation | شێتیی، دینێتیی، جیابوونەوەی فرمانیی و پچڕانی ئەو كەسە لە شوێنەواری دەورو پشتی خۆی. |
| جنون الماشية | Locoism | شێتیی چوارپێ، هاریی ئاژەڵ، نەخۆشی‌یەكی دەمارییە تووشی ئاژەڵ و وڵاخ دەبێت بە خواردنی روەكی شێتیی. |
| جنون المراهقة، فصام | Schizophrenia | (شیزوفرینیا)، شێتیی هەرزەكاریی. |
| جنون الرقص | Dancing mania | شێتی هەڵپەڕین، شێتی سەماكردن، جۆرە نەخۆشی‌یەكی دەماریی درمە. |
| جنون القتل | Homicidal-mania | شێتیی كوشتن، شتێك ئارەزووی كوشتن بكات. |
| جنون العظمة | Paranoia | شێتیی لەخۆبایی بوون. |
| جنون السرقة | Kleptomania | شێتیی دزیی، شێتێك ئارەزووی دزیی بكات. |

| | | |
|---|---|---|
| جنون شبقي | Erotomania | شێتی ئالۆش. |
| جنور، مساحة، منطقة | Area | خەرمانی گەنم و جۆ، زەویی بە گەنم و جۆ چێنراو. |
| جنوح | Delinquency | سەرپێچیی کردنی یاسا لە تەمەنی منالّیدا، گوناهباریییەکە لە تاوان کەمترە. |
| جنوب | South | باشوور، وەشت، راژێر، خواروو. |
| جنوب شرقي | South-east | خوارووی خۆرهەلآتیی. |
| جنوب غربي | South-west | خوارووی خۆرئاوایی. |
| جنوب قبلي، ريح او رياح جنوبية | South-wind | بای باشووریی، بای وەشت. |
| جنوبي | Southern | خوارویی، باشووریی. |
| جنينة | Little-garden , Fruit-garden | باخچە،لاتك، پالیز. |
| جنين | Embryo, Foetus | بەرخۆلە، ئاوەلەمە، پس، بز، بێچوو، کۆرپە، پێچولە، بەچکە، ساوا، کۆرپەلە پێزە. |
| جنين نباتي | Embryo of plant | چلّمەلەتە، بەرخۆلەی روەك. |
| جنين، مشوة التكوين | Monster | بەرخۆلەی عاجباتی ، بەرخۆلەی نارێك، بێچووی نارێك. |
| جني الأزهار | To gather Flowet<br>Gathering-Flower | گوڵ چنین، گوڵەوەچنیی. |
| جني | To gather, plucK | چنینەوە، بەرچنی، رنین، دەسکەنە. |
| جنيب | Pleuritic | ئاو بەنگ دار، کەسێك تووشی ئاوبەنگی سپی بووبێت. |
| جنيبرة،قنيبرة، حرف، قرة العين | White-Weed, Hoary | تەرەتیزە، گیایەکە گوڵی سپی بچووك دەگرێت. |
| رشاد | Crees, White-top | تۆوەکەی رەشە تامەکەی توونە. |
| جنيبة | Herbaceous | بنج، دەوەن. |
| جنيه انكليزي | Guinea | ٢١ شلن، جونەیهی ئینگلیزیی. |
| جنيه انكليزي (ذهب) | Sovereign | (سوڤەرین)، جونەیهی انگلیزیی زێڕیی. |
| جنية انكليزي (ورق) | Pound | پاوەن، جونەیهی ئینگلیزیی کاغەز. |
| جنيه مصري، ١٠٠قرش | Egyptian pound | جونەیهی میسری ، ١٠٠قرش. |
| جهادي | | جیهادیی، دراوێکی(پارەیەکی) عیراقیی کۆنە لە زێڕ دروست کراوە. |
| جهات اربعة، خوافق | Cardianal-points | چوارلاکە، چوارخالّەکە ، باکوورو خۆرهەلآت و باشورو خۆرئاوا. |
| جهارة الصوت | Loudness ofsound | دەنگ بەرزی، دەنگ گەورەیی، پلەی هەست کردن بە زەبری یان تینی دەنگ. |
| جهار كاه، جهاز كا | | چوارگا، ئاوازی چوارەم لە مۆسیقادا. |
| جهاز، (الآلة) | Apparatus Set,App | دەزگا، کۆمەڵێك ئامراز. |
| جهاز (في الحيوان والنبات) | System | کۆئەندام، بریتیە لە کۆمەڵێك ئەندام لە گیاندارو روەکدا.وەکوو کۆئەندامی هەرس کردن. |
| جهاز بوابي | Portal-System | کۆئەندامی دەرگاوان، ئەو کۆمەڵە بۆرییییەی کە خوێن لە بۆڕی (قناە) هەرسەوە. کۆدەکەنەوە. |
| جهاز الدوران | Sirculatory-System | کۆ ئەندامی سووڕانی خوێن، کۆئەندامی خوێن. |
| جهاز بولي تناسلي | Urogenital-system<br>Urinogenital-system | کۆ ئەندامی میزو زاوزێ. |

| | | |
|---|---|---|
| جهاز عصبي | | كۆئەندامی دەماریی. |
| جهاز عصبي مركزي | Central, Nervous-System | كۆئەندامی دەماریی چەقیی. |
| جهاز عصبي محيطي | Peripheral-nervous-System | كۆئەندامیی دەماریی دەوروپشت، كۆئەندامی دەماری چێوەیی. |
| جهاز الحركة | Motion-System Movement-System | كۆئەندامی جوڵانەوە. |
| جهاز كلوي | Renal-System | كۆئەندامی گورچیلە. |
| جهاز تناسلي، جهاز التناسل | Reproductive-System, Genital-System | كۆئەندامی زاوزێ. |
| جهاز وعائي مائي | Water-vascular-System | كۆئەندامیی بۆریی ئاویی، كۆئەندامێكە لە لەشی هەندێك گیانداردا وەكوو ئەستێرەی دەریا یارمەتی دەدات لە جووڵانەوەو رۆیشتندا. |
| جهاز وعائي | Vascular-System | كۆئەندامی بۆڕییانە، دەزگای بۆڕییانە. |
| جهاز التنفس | Respiratory System | كۆئەندامی هەناسەدان. |
| جهاز عضلي | Muscular- System | كۆئەندامی ماسولكە. |
| جهاز الهضم | Digestive- System | كۆئەندامی هەرس. |
| جهاز البول | Urinary- System | كۆئەندامی میز. |
| جهاز عصبي تلقائي (ذاتي) | Autonomic- nervous- nervous System | كۆئەندامی دەماری خۆكار، كۆئەندامی دەماری خۆكاریی، كۆئەندامی دەماری ئۆتۆنۆمیی. |
| جهاز عصبي عطوف، جهاز عصبي سمبثاوي | Sympathetic- nervous- System | كۆئەندامیی دەماری سیمپە ثاویی، كۆئەندامی دەماری بەسۆز. |
| جهاز لمفاوي | Lymphatic System | كۆئەندامی لیمف. |
| جهاز ويبر | Weberian- apparatus | دەزگای ویبەر، كۆئەندامێكە لە لەشی ماسییدا یارمەتی دەدات بۆ پێكهێنانی دەنگ یان بیستن بریتیە لە چوار بڕبڕەو توورەكەی گازی ماسیی كە ئەندامی دەنگ پێك دەهێنن. |
| جهاز عظمي، هيكل عظمي | Skelton | كۆئەندامی ئێسكی ، پەیكەری، ئێسكی لەشی گیاندار. |
| جهاز الأبراز، جهاز الأفراغ | Excretory-System | كۆئەندامی دەرهاوێشتن(بۆ پیسایی). |
| جهاز هافرس | Haversion-System | كۆ ئەندامی هاڤەرس، بریتیە لە بۆڕی (قناە) هاڤەرس و بەردەكانی دەوروپشتی لەناو ئێسقاندا ئەو بۆشاییەی كە مەغزەكەی (مۆخەكەی) تیایە، دەگەێنێت بە رووی ئێسقانەكە بۆڕی خوێ و دەماری پیادا تێپەڕ دەبێت. |
| جهاز جولجي، جهاز كولجي، جسم كولجي | Golgi-apparatus, Golgi-body | تەنی گوڵچی، كۆئەندامی گوڵچی، كۆمەڵە بەرەمیەكە لە شێوەی بۆڕیدا لە سایتوپلازمی خانەی لەشی گیانداردا پەیوەندی هەیە بە كرداری دەردانەوە. |
| جهاز العروس | Brides-outfit | جیازیی بووك، ئەو شتوومەكەی كە بووك لەگەڵ خۆیدا دەیبات بۆ ماڵی زاوا. |
| جهاز التفريخ، محضن جهاز الحضن | Incubator | مەكینەی جووجەڵە، دەزگای جوجوڵە هەڵ هێنان. |
| جهاز التعقيم، جهاز التطهير | Sterillizer-apparatus | دەزگایەكە لە پزیشكیدا بەكاردێت بۆ پاكژكردنەوەی ئامرازو كەل و پەل، دەزگای پاكژ كردنەوە. |
| جهاز التجميد، مجمدة | Freezing-apparatus | دەزگای بەستن، فرێزەر |
| جهاز كلود | Claude | دەزگای كلۆد، دەزگایەكە بۆ شلكردنەوەی هەوا. |

| | | |
|---|---|---|
| جهاز التبريد | Cooling-System | دەزگای ساردکردنەوە. |
| جهاز الأستقطاب | Polarimeter | (پۆلاریمەتر)، دەزگای جەمسەرگرتن، دەزگای پۆلگرتن، دەزگای پێوانی پۆل گرتنی شەپۆلی رووناکیی. |
| جهاز الحاكي، جرامفون، غرامفون | Gramophone, Phonograph | (گرامۆفۆن)، (فۆنۆگراف)، سندووقی گۆرانیی، دەزگای گۆرانی یان قسەکردن. |
| جهاز التعقيم، اوتوكلاف | Autoclave | (ئۆتۆکلێف)، دەزگای پاکژکردنەوە، دەزگایەکە بە هەڵم یان کارەبا گەرم دەکرێت بۆ پاکژکردنەوەی ئامرازی نەشتەرگەریو جلو بەرگ. |
| جهاز فحص الحلق | Laryngoscope | (لارینگوسکۆب)، دەزگای پشکنینی قورگ. |
| جهاز الطرد المركزي | Centrifugal-apparatus | (سەنتریفیوج)، دەزگایەکە بۆ جیاکردنەوەی ئەو مادانەی کە تێکەڵاونو جیاوازن لە خەستیدا وەکوو مادەی رەقو شلە. |
| جهاز قياس الذبذبات | Vibrograph | (ڤیبروگراف)، (ڤیبرومیتەر)، دەزگای پێوانی لەرینەوە. |
| جهاز الحث الكهربائي | Inductor | دەزگای هاندانی کارەبایی. |
| جهاز فحص العين، معيان | Ophthalmoscope | (ئۆثالمۆسکۆب)، دەزگای پشکنینی چاو. |
| جهاز فحص الصدر، المسماع | Stethoscope | دەزگای تەماشاکردنی سینگ، دەزگای پشکنینی سنگ. |
| جهاز الهبوط | Landing-System | دەزگای نیشتنەوەی فڕۆکە. |
| جهاز لاسلكي، جهاز ستقبال لاسلكي | Wireless-apparatus, Wireless receiving-set | دەزگای بێتەل، دەزگای لاسلکی، دەزگای وەرگرتنی لاسلکی. |
| جهاز عرض الصور، فانوس سحري | Magic Lantern, Lantern Slides projector | دەزگای وێنە پیشاندان. |
| جهاز السمع ، مستقبل التلفون، سماعة التلفون | Telephone-receiver | دەزگای وەرگرتنی تەلەفۆنی ، دەزگای بیستن، بیستۆکی تەلەفۆن، ئامرازێکە تەوژمی کارەبایی دەگۆڕێت بۆ دەنگ. |
| جهاز الطلي الكهربائي | Cupper Voltameter | دەزگای رووکەشکردنی کارەبایی. |
| جهاز قياس الأمتصاص | Absorption-meter | دەزگای پێوانی هەڵمژین. |
| جهاز التمدد الطولي | Linear-expansion-apparatus | دەزگای کشانی درێژیی. |
| جهاز التقطير | Distillation- apparatus | دەزگای دڵۆپاندن. |
| جهاز ليند | Lindes- apparatus | دەزگای لیند، بۆ ئامادەکردنی ئۆکسجینو بە شلکردنەوەی هەوا. |
| جيهاز بيوكس | Bouyoucos apparatus | دەزگای بیۆکس، دەزگایەکە بۆ پێوانی شێ. |
| جهاز تغيير السرعة، مقياس التغيير | Variometer | (ڤاریومیتەر)، دەزگای گۆڕینیی خێرایی، پێوەری گۆڕان، دەزگایەکە بۆ پێوانی گۆڕانیی خێرایی سەرکەوتنو داکەوتنی فڕۆکە بەکار دەهێنرێت. |
| جهاز توليد الذبذبات | Oscillator | دەزگای پەیداکردنی لەرە. |
| جهاز التصادم | Percussion- apparatus | دەزگای بەر یەك کەوتن. |
| جهاز الأمتصاص | Suction-apparatus | دەزگای مژین. |
| جهاز كب | Kipps-apparatus | دەزگای کیپ، بۆ پەیداکردنی گازی هێدرۆجین سولفاید. |
| جهاز التحليل الكهربائي للماء | Voltameter, Water-analysis-apparatus | (ڤولتامیتەر)، دەزگای شیکردنەوەی کارەبایی، دەزگای شیکردنەوەی ئاو بۆ هادرۆجینو ئۆکسجین بە کارەبا. |
| جهاز فكتورماير | Victormayer- apparatus | دەزگای ڤیکتورمایەر، دەزگایەکە بۆ دۆزینەوەی خەستی هەڵمی مادەکان. |

| | | |
|---|---|---|
| جهاز السلم الموسيقي | Xylophone | (زیلۆفۆن)، دەزگای پلیکانەی مۆزیقا، دەزگای پەیژەی مۆسیقیی. |
| جهاز الأرسال التلفوني | Telephone-Transmitter, set | دەزگای ناردنی تەلەفۆنی. |
| جهاز هوب | Hopes apparatus | دەزگای هۆپ، دەزگای پێوانی بەرزترین خەستی ئاو. |
| جهاز قياس الأرتفاع | Altimeter | دەزگای پێوانی بەرزی دەزگایەکە لە فڕۆکەدا بەکاردێت بۆ پێوانی بەرزی. |
| جهاز بيكمان | BecKmann- apparatus BeacKman- apparatus | دەزگای بێکمان، دەزگایەکە بۆ پێوانی خاڵی (نقطة) بەستن و کوڵان لە شلەکاندا بەکاردێت. |
| جهاز التنافذ | Osmosis pressore app | دەزگای دەلاندن، دەزگای ئۆزمۆزی. |
| جهاز التقويم | Rectifier- apparatus | (ڕێکتیفایەر)، دەزگای ڕاستکردنەوەی تەوژمی کارەبا. |
| جهاز باسكال | Pascals apparatus | (دەزگای پاسکال)، بۆ گەورەکردنی هێزی بچووک. |
| جهاز قياس الضغط، مضغاط | Manometer | (مانۆمیتەر)، دەزگای پێوانی پاڵەپەستۆی گازو خوێن. |
| جهاز الكرة والحلقة | Ring and ball apparatus | دەزگای تۆپ و ئەلقە. |
| جهاز الموازنة | Equilibium- apparatus | دەزگای هاوسەنگی. |
| جهام | Cloud with out rain | هەوری بێ باران. |
| جهاض، اراك | Tooth-brush-tree | داری سیواك، دەوەنێکی پزیشکی‌یە ڕەگەگەی توونە، گەلاکەی بۆ ڕەوانی باشە، بەرەکەی لە ترێ دەچێت زەردە دەخورێت، لاسکەکانی بۆنخۆشن سیواکیان پێ دەکرێت. |
| جهارة، اعسام | Morphology, phytoraphy | (مۆرفۆلۆجی)، (فایتۆگراف)، زانیاریی خوێندنی شێوەی دەرەوەی ڕواڵەتی زیندەوەر. |
| جهة، طرة | Side, Direction | بەر، لا، تەك، تەنیشت، لایەن، دیو. |
| جهبر | She bear | ورچی مێ. |
| جهبل،علب، قلمود، قينس، ناخس،يرع | Tragelaphus | (تراجیلافەس)، جۆرە ئاسکێکی گەورەیە، شاخەکەی پێچاو پێچە. |
| جهد، مجهود | Potential, Effort | ئەرك، کۆشش، تەقەلا، ڕەنج، ئەمەك. |
| جهد كهربائي فولطية | Voltage, Electric-potential | پاڵەپەستۆی کارەبایی، پەستانی کارەبا، ئەرکی کارەبایی، ئەو جیاوازییە کە لە نێوانی دوو بارگەی کارەباییدا هەیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە یەکێکیان بەرەو ئەوی تریان بڕوات. |
| جهد القطب | Potential | ئەرکی جەمسەر، ئەرکی پیتە، ئەرکی پۆل. |
| جهد التفريغ | Discharging potential | ئەرکی بەتاڵ کردنەوە. |
| جهد الأستقطاب | Polarization-potential | ئەرکی پۆل گرتن. |
| جهد الأشتعال | Ignition-potential | ئەرکی سووتان. |
| جهاز التاين | Ionization potential | ئەرکی ئایۆنێن. |
| جهد القياس | Standard potential | ئەرکی پێوان. |
| جهد التاكسد | Oxidation potential | ئەرکی ئۆکسان. |
| جهد الأختزال | Reduction potential | ئەرکی لێکردنەوە، ئەرکی کەمکردنەوە. |
| جهد اضافي، فوق الفولطية | Additional potential | ئەرکی سەربارە، سەروو فۆڵتیەت. |
| جهد مغناطيسي | Magnetic potential | ئەرکی موقناتیس، ئەرکی ماگنیتیك. |

| | | |
|---|---|---|
| جهر، عمى النهار | Day-blindness | رۆژ كوێریی، رۆژ نەبینیی، کەسێك کە بە رۆژ چاوی نەبینێت. |
| جهر، جهار | Publicity | ئاشکرا، ئاشکراکردن، دەرخستن، درکاندن. |
| جهري، علني | Public | ئاشکرایی. |
| جهض، اجهاض | Abortion, Miscarriage | لەبارچوون، لەباربردن. |
| جهل، جهالة | Ignorance | نەزانین نەفامیی. |
| جهلول، بكاشين، شكب، فرار، شنقب | Snipe, sand-piper | قوراویلە، قوراویلکە، باڵندەیەکی دەنووك درێژە. |
| جهم، متجهم | Grim,Gloomy | مۆن، رووگرژ، دەموچاو ترش. |
| جهنم، جحيم | Hell, Hades | دۆزەخ، دۆزەهە، دۆژ. |
| جهنمية، بوغنفيلية، جهنمي | Bouguainvilla Chinese-paper-Flower | جەهەنەمیی، دەوەنێکی خۆهەڵواسەری کەپرینە گوڵی بنەوشەیی یان پەمبەیی یان زەرد یان سوور دەگرێت بۆ رازاندنەوە بەکاردێت. |
| جهوري، عالي | Loud | بەرز، دەنگی بەرز، دەنگی گەورە. |
| جهيزة، جرو الدب | Bears-cub | بەچکەی ورچ. |
| جهيض، مجهض | Abortive | لەبارچوو،منداڵێك بەر لەکاتی تایبەتیی خۆی لەدایك ببێت. |
| جواب | | تیژڕەو، باڵندەیەکی خۆش رەوە. |
| جواب، جوال | Traveller | گەڕۆك، گەڕۆ، گەڕیدە، جیهانگەڕ. |
| جوار | Roaring, Bellowing | بارەباڕ، باڕاندن، قوڕە، قوڕاندن. |
| جواز | Permissibility | رەوایی، هێشتن، شیان. |
| جوال | Sieep-WalKing | رۆیشتن بەدەم خەوەوە. |
| جوافة | Guave | (گواڤا)، درەختێکی ناوچە گەرمەکانە، بەرەکەی لە لیمۆ دەچێت خۆشە دەخورێت و دەکرێت بە مرەبا. |
| جواف | | جۆرە مرەبایەکە. |
| جوالق، جوال، غرارة | SacK, bag | جەواڵ، خەار، تەلیس، جەنتك، خاش. |
| جواهر، مجوهرات | Jewellery | گەوهەر، پێزە، بلەخش. |
| جواهري، جواهرجي | Jeweller | گەوهەرفرۆش، گەوهەرگر، تیت. |
| جوارح، كواسر، سباع الطير | Rapacious, birds | باڵندە گۆشتخۆرەکان وەکوو بازو هەڵۆ و کوڵارەو سیسارك و داڵو کوندەبەبو، هەندێك بە رۆژ هەندێکیان بەشەو دەگەڕێن. |
| جواز السفر | Passport | پاسپۆرت، دەفتەرێکە گەشتکەرەکان وەری دەگرن تا لە وڵاتی خۆیانەوە رێ بدرێن بۆ گەشت بچن بۆ وڵاتانی تر. |
| جوالة، جوال | Rover wanderer | گەڕۆك، دیدەوان. |
| جؤجؤ | Carina | جۆرە ئەستێرەیەکە. |
| جؤجؤ، عظم القص | Sternum , prow, Carina | بەرسنگ، ئێسقانی کۆڵەی سنگی باڵندە، پەراسوبەندی باڵندە. |
| جؤجؤيات | Carinata | (کارینانا)، باڵندە کۆڵەدارەکان وەکوو زۆربەی باڵندەکان کە توانای فڕینیان هەیە. |
| جواثم | Sparrows, passeres | پاساریی‌یەکان، هەڵنیشتووەکان، کۆمەڵە باڵندەیەکە، وەکوو چۆلەکەو ریشۆلەو قەلەڕەشکە. |
| جواب | Answer | وەڵام ، بەرسڤ. |
| جواناكو | Guanaco | (گواناکۆ)، گیاندارێکی شیردەرە لە کۆمەڵەی وشتر لە گیانداری (لاما) دەچێت لە ئەمەریکا دەژی. |

| | | |
|---|---|---|
| جواد | Saddle- horse, Steed | ئەسپی سواریی، ئەسپی زین. |
| جوار، جيرة | Neigh bourhood | دراوسێتیی، هاوسێتیی. |
| جوبة | Space-line | ماوەی نێوانی دوو ریز لە کشتوکاڵ یان دارو درەخت لە باخ و کێڵگەدا. |
| جوبة، جابية | SinKhole | (سینکهۆل) ئەو چاڵاییەی کە لە رووی زەوییدا پەیدا دەبێت لە ئەنجامی توانەوەی بەردی قسل لە ئاوی باراندا. |
| جوب، رود | Penetration | کون کردن، سمین. |
| جوبية، نارجيل شيلي | Coquito-palm | (دارخورمای کۆکیتۆ)، جۆرێکە لە دارخورما بەرەکەی لە گوێز دەچێت. |
| جوتر،غوتر، مرض الغدة الدرقية، داء الخنازير، نوطة | Goitre, Bronch-ocele, Goiter | (برونکۆسیل)، نەخۆشیی گویتەر، نەخۆشیی گریێ، ئاوسانی لووی سایرۆید، دەرپۆقینی گلێنەی چاو و ئاوسانی لووی ژێر مل. |
| جوت، قنب كالكوتا، الياف القنب الهندي | Jute, Gunny-bag | رووەکی گوش، گووشی کەلکەتا، گیایەکی کشتوکاڵییە بۆ دروستکردنی گوێنیی و کومبارو پەت لە ریشاڵی قەدەکەی دەروێنرێت. |
| جوتا برشا | Guttapercha | (گوتاپێرچا) جۆرە درەختێکە لاستیك لە توێکڵەکەی دەگیرێت. |
| جوه، صد االجديد | Rust | ژەنگی ئاسن. |
| جوث، قبة | Rennet | کلۆقازیی، لە گەدەی گیاندارە کاوێژکەرەکان. |
| جوثن، جاسنت، ياسنتوس | Hyacinth | (جاسنت)، گیایەکە لە کۆمەڵەی زەمبەق گوڵەکەی لە رەنگۆڵە دەچێت و بۆن خۆشە. |
| جوح، دلاع، بطيخ هندي، بطيخ رقي، جبس | Water-Melon | شووتی، کاڵەکی شامیی. |
| جوح، جياحة، ابادة | Annihilation | قەڵاچۆکردن. |
| جوخ | Cloth, Broad-cloth | چۆخ، چۆخە. |
| جود، مطر غزير | Heavy-rain | بارانی بە لێزمە، شەستە باران. |
| جودة، صلاحية | Goodness, Efficiency | چاکی، باشیی. |
| جودي، قربة الماء | Water-sKin | چەوەندە، جەندیلە، کوندەی بچکۆلە. |
| جوداس، زمزريق | Judas-tree | درەختی ئەرخەوان. |
| جودار، شيلم، جاودار | Rye | چەودەر،گیایەکە لە کۆمەڵەی گەنم. |
| جؤذر،جوذر | Savage calf | گوێرەکە کێویی، بێچووی مانگای کێوی. |
| جوراب، جورب | StocKing | گۆرەویی، گۆریە، گۆرە. |
| جور، غور | Indian-urus, Gaur, Indian-bison | گەوەر،جۆرێکە لە مانگا کێویی. |
| جوري | DamasK-rose Bengal-rose | شەستپەر، جۆریی، گوڵێکی بۆن خۆش و جوانە. |
| جورس | Gerris | (جیریس)، جۆرە مێروویەکی باریکی رەشە بەسەر ئاوەوە هاتوچۆ دەکات. |
| جورق، ظليم | Ostrich(male) | نێرەی وشترمر. |
| جوراسي، جوري | Jurassic | (جوراسیك)، سووڕی دووەم لە سەردەمی (حقبە) ژیانی ناوەڕاست لە مێژووی جیۆلۆجیدا، ئەم سووڕە سەدەی گیاندارە خشۆکەکان بوە. |
| جوز ارمد | Butter-nut | گوێزی کەرە، جۆرە گوێزێکە بەرەکەی هێلکەیی توێکڵ تەنکە کاکڵەکەی خۆشە. |
| جوز العنق،جوزة الحلقوم، حرقدة، حردقة | Adams-apple | قورقوراگە، کەڵەبابەی گەردن. |

| | | |
|---|---|---|
| جوز اخضر، جوز فريك | Unriped-Walnut | فەریکە گوێز، کەمکۆڵ، گوێزێك، کە توێکڵە سەوزەکەی پێوەمابێت. |
| جوز الزنج، كولا | Kola-nut- tree | دارگوێزی کۆلا، درەختێکە لە ناوچە گەرمەکاندا دەڕوێت بەرەکەی (٢-١٠) ناوکی سووری تیادایە لە بادەم دەچێ، بەرەکەی دەخورێت بۆ ورپاکردنەوەی لەش باشە. |
| جوز الصخور | Juglans-Rupestris | گوێزی بەردەڵان، جۆرێکە لە دار گوێز بەرەکەی بچووك و هێلکەیی یە. |
| جوز امريكي | BlacK-Walnut | گوێزی رەش، گوێزی ئەمریکیی. |
| جوز اسود | Juglans-nigra | گوێزی رەش، بەرەکەی نیمچە خڕو کاکڵەکەی خۆشە، تەختەکەی نایابە. |
| جوز الهند، نارجيل مقل | Coconut palm Coco-nut | گوێزی هیندی، درەختێکە لە دارخورما دەچێت لە وڵاتە گەرمەکاندا دەڕوێ بەرەکەی گەورەیەو بەگوش داپۆشراوەو شیری تیایە، رۆنی لێ دەردەهێنرێت، وە لە گوشی دەوروبەرەکەی چنراوی گوێنیی دروست دەکرێت. |
| جوز الفوفل، نخيل الفوفل، كوثل، اطماط تانبول، تامول | Areca, Areca-catechu, Betel- palm | (دارخورمای بیتیل)، فوفل، جۆرە دارخورمایەکی هیندییە بەرەکەی لە گوێز دەچێت و مادەی ورپاکەرەوەی لێ دەردەهێنرێت. |
| جوز الطيب، جوزبوا بسباسة، الطبيب/ ضبر | Nutemg-tree, Musty-nut | والەك، گوێز بۆ، بۆنی گوێز، گوێزبەوە، درەختێکی شوێنە گەرمەکانە بەرێك دەگرێت وەك گوێز وایە زەردە توێکڵەکەی بۆ بەهارات و دەرمان بەکار دەهێنرێت، کرۆکی بەرەکەی چەورو بۆن خۆشە. |
| جوز ارقم، تاخوطة، اكثار اجرد | Arnut, pig nut | (ئەرنەت) گوێزە بەرازانە، گوێزە خوگانە، رووەکێکی ژەهرینی سەلك دارە گەڵاکەی لە گەڵای گەرەوز دەچێت، تۆوەکەی رەوان کەرە سەلکەکەی بۆ هەرس کردن و میزکردن باشە. |
| جوز | Common-walnut | گردەکان، گوز، گوێز، جووز، درەختێکی گەورەیە نزیکەی ٢٥ م بەرزدەبێتەوە گەڵاکەی دەوەرێت، سێبەرێکی خۆشی هەیە لە ناوچەی بەرزو سارددا دەڕوێت، بەرەکەی گوێزەو بە نرخە لە خواردندا، چونکە چەوری و پرۆتینی تیایە،تەختەکەی بە نرخە، کەلوپەلی ناوماڵی لێ دروست دەکرێت ، چونکە قایم و جوانە درز نابات، توێکڵی درەختی گوێز رەنگ و دەرمان و مادەی دەباغ کردنی لێ دەردەهێنرێت جۆرەکانی وەکوو گێرك، رەوگە. |
| جوز الكولة | Kola-nut, Cola nut | گوێزی کۆلا، کۆلا، بەری ئەم رووەکە لە هەندێ شوێن لە جیاتی چایی و قاوە بەکار دەهێنرێت، مادەیەکی تیایە ورپاکەرەوەیە بۆ مێشك و دڵ. |
| جوز جندم، جندم، منغستان | Mangosteen-tree | (مانگۆستین)، درەختێکە بەرەکەی خڕە بەقەدەر پەتەقاڵێك دەبێت سوورو بۆن و تام خۆشە رۆنی لێ دەردەهێنرێت. |
| جوز سيبولد | Juglans-Sieboldina | (گوێزی سیبولدینا)، جۆرێکە لە داری گوێز بەرەکەی خڕو تووکنە بە شێوەی هێشووە. |
| جوز الشرك، هال جوزي | BlacK-amomum | هێل، حێل، قاخلی، کاژیلە. |
| جوز البلوط، جوزة البلوط | Acom-mast | مازوو، مازیی، گزگل، گروان. |
| جوز مقي، جوز القيء، اذاراقي، ستريكنوس، حب الغراب | Nux-vomica, tree-Strychnos nuxp vomico, Dog-button, Vomit-nut | گوێزی رشێنەوە، رووەکێکی ناوچە گەرمەکانە، گوڵەکەی سەوزە، بەرەکەی بە قەدەر پرتەقاڵێکی بچووك دەبێت، لە دەنکی بەرەکەی مادەیەکی ژەهر دەردەهێنرێت وە پێی دەوترێت (سترکنین) کە دەبێتە هۆی وەستاندنی هەناسە. |

| | | |
|---|---|---|
| جوز ماثل، بقم | Metel, Downy-thorn apple | (میتیل)، تاتوورەی توکن، جۆرێکە لە تاتورە، دەوەنێکی پزیشکی ژەهرە، گوڵەکەی سپی و بۆنخۆشە بەرەکەی تووکنە، هەندێك دەرمانی پزیشکی لێ دەردەهێنرێت. |
| جوز ناق، اذن الدب | Bears ear | گوێ ورچە، گیایەکە گەڵاکەی تووکنە گوڵەکەی فستقیيە. |
| جوز لرتة، بندق هندي | NicKer-tree | فنقی هیندیی، گوێزی لەرتە، دەوەنێکە گوڵەکەی سپییە بەرەکەی درکاوییە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| جوز مجنح، جوز مراني، عرتون | Pterocarya | (پتێرو کاریا)، گوێزی باڵدار، جۆرێکە لە گوێز بەرەکەی باڵدارە کاکڵەکەی گەنم رەنگە ناخورێت. |
| جوزة | Nut, nux | قۆزاخە، گوێز. |
| جوزة القز فليجة | Co Coon | قۆزاخەی ئاوریشم. |
| جوزة الأرض ، فستق العبيد | Pea nut, Ground-nut | گوێزی زەویی، پاقلەی سودانیی، فستقی کۆیلەکان، بستەی کۆیلەکان. |
| جوزة البرازيل | Brazil nut | گوێزی بەرازیل، درەختێکە لە بەرازیل دەروێت، گوێزەکەی شێوەیەکی سێ گۆشەیی قاوەیی هەیە، رۆنی لێ دەردەهێنرێت. |
| جوزة كاشو، جوز الكاشيو، بلانر، كابلي انقردية، مغنة | Anacardium, Cashew-nut, Acajou, Mahogany | گوێزی کاشوو، درەختێکە لە کۆمەڵەی قەزوان لە بەرازیل و ناوچە گەرمەکانی دەروێت، گوێزەکەی بچووکەو بە قەدەر سەری پەنجەیەک دەبێت و چەماوەیەو رۆنی لێ دەردەهێنرێت لە قەدەکەی زەمقی کاجوو(کاشو) دەردەهێنرێت. |
| جوزق، جوزة القطن | Nut- of -Cotton Capsule of nut | گوێزك، قۆزاخەی لۆکە. |
| جوزق، جولزق، بيض برشت | Soft-boiled-egg | هێلکەی دەڵەمە. |
| جوراء توامان، ميزان، كوكبة الجبار | Orion,Twins, Gemini | ئۆریۆن، دووجمکە، دوانە، کەشکەشان، کەشکەلان، تەرازوو، ئەستێرەیەکە لە لە ناوەراستی ئاسماندا، یەکێکە لە کەلوەکانی ئاسمان. |
| جوزل، زغلول | Young-pigeon,Squab | بەچکە کۆتر. |
| جوساني | Bovista | (بۆڤیستا)، جۆرێکە لە قارچك دەخورێت. |
| جوسيا، طبيجا | Primiose-Willow | گوڵە بەهارییی، گیایەکە قەدەکەی تووکنە گوڵەکەی گەورەو زەردە. |
| جوس، استقصاء | Exploration | لێ کۆڵینەوە. |
| جوسق، قصر | Castle | کۆشك، تەلار. |
| جوشن | Plastron,Thorax | قەڵغانی کیسەڵ، قەڵغانی ژێر ، سکی کیسەڵ، سنگی مێروو. |
| جۆشوش | | ئێسکی سنگی باڵندە، کۆڵەی سنگی باڵندە. |
| جوشمة، بط سماري | Gadwall | جۆرێکە لە مراوی ، مراوییە کێوییی. |
| جوع | Hunger | برسێتیی، خورێنیی، برسیی بوون، برچیی بوون. |
| جوعان، جائع جوع البقر | Hungry | برسیی، ئاوارا، سیروژە، برچیی،تێرنەخۆریی، تێرنەبوون. |
| جوف البطن | Abdomen, Belly | بۆشایی سك. |
| جوف الأرض، لب الأرض | Centro sphere | (سێنترۆسفێر)، بۆشایی ناوەوەی زەویی ، کرۆکی زەویی. |
| جوفاء | Hollow, Concave | بۆش، پوچ، پووت، کلۆر. |
| جوف الجسم | Coelom | بۆشایی لەش، بۆشایی لەشی گیاندار، ئەو بۆشاییەی کە هەناوی تیایە. |
| جوف الصدر، جوف صدري | Thorax, Thoracic-Cavity | بۆشایی سنگ. |

| | | |
|---|---|---|
| جوف جنبي | Pleural-Cavity | بۆشای پەردەی سیی. |
| جوف | Inside, Cavity | ناوەوە، بۆشایی. |
| جوفي | Coeliac | بۆشایی. |
| جوف بني | Core-Flush | (کۆرفلەش)، کرۆك قاوەیی، نەخۆشەییەکی رووەکی‌یە، ئەدات لە بەری سێو کە لە بەفر خەرمەوەدا هەڵ ئەگیرێت پەڵەی قاوەیی لەسەر پەیدا ئەبێت. |
| جوف مائي | Water-core | کرۆك ئاویی، نەخۆشی‌یەکی رووەکییە ئەدات لە بەری سێو. |
| جوف الأنف | Nasal-Cavity | کونەلووت. |
| جوفية المعي، جوفمعيات، لاحشويات | Coelenterata | گیانداره ریخۆڵە بۆشەکان، گیانداره بۆش ریخۆڵەییەکان، بێ هەناوەکان، کۆمەڵە گیاندارێکن لەشیان لە لوولە ئەچێت، خواردەمەنیی تیا هەرس ئەکرێت، تەنیا یەك کونیان هەیە لە جیاتی ئەمو کۆم وەکو گیانداری هایدرا، گوڵاڵەی ئەریا،و چرای ئەریا. |
| جوق موسيقي، جوقة موسيقية | Musical-band | تیپی مۆسیقا، تیپی مۆزیقە، تیپی ساز. |
| جوقة | Band, Troop | باند، تیپ |
| جوكان | HocKey | (هۆکیی) تۆپو داردەست، یارییەکە بە سواری وڵاخەوە ئەکرێت. |
| جوكي | JocKey | (جۆکی)، ئەوەی کە سواری ئەسپەکە ئەبێت، هەتا ئەیباتە مەیانی غارغارێنەکە. |
| جولوز | Gulose | (گولۆز)، جۆرەشەکرێکی تاکییە. |
| جوليانا، نسائية، زهرة المساء الجميلة | Queens-gilly Flower-Sweet-rocKet | (هیسپیریس)، گوڵە ئێوارە، شەوبۆی خانم، گیایەکە گوڵی شین یا بنەوشەیی یان سپیی یان سوور ئەگرێت، لە ئێوارانەدا بۆنێکی خۆش ئەدات. |
| جولق | SacK, Bag | جەواڵ، خاش، خەرار، تەلیس. |
| جولق، وزال | Furze, Gorse,Thorn-broom | فیورز، جۆرە رووەکێکە بەشێوەی ئەوەنە گوڵەکەی زەردە بەرەکەی وردە. |
| جولف | Golf | (گوڵف)، جۆرە یارییەکە بە تۆپو گۆچان ئەکرێت. |
| جول | Joule | (جوول)، یەکەی پێوانی ئیش، یەکەی گەرمی‌یەکەی وزە، کە بریتییە لە (٤٢٠٠) کالۆری، ١٠ ملیۆن ئێرك یان ٧٣٧و٠ پێ پاوند. |
| جولة (في المباحثات) | Around | جار. |
| جولة، سفرة | Tour, Atravlling-round | گەڕان،گەشت. |
| جولة في (الألعاب)، شوط | A roumb | کایە. |
| جوميس | Geomys | (جیومایس)، گیاندارێکی قرتێنەرە لە سمۆرە ئەچێت لەژێر بنکی درەختدا قوموش لێئەدات. |
| جومة نول، منول | Loom | مەکۆ، تەون، ئامرازی چنین. |
| جومار | Capital | سەرمایە. |
| جونيومتر، مقياس الزوايا | Gonio meter | (گۆنیومیتەر)، ئەزگایەکە بۆ پێوانی گۆشەی کریستاڵ. |
| جون، خليج، جون | Bay | کەنداو. |
| كميت | Bay | شێ، رەنگێکی رەشی مەیلەو سورە. |
| جونة | Sunset | خۆر لەکاتی ئاوابووندا. |
| جونة، سلة | BasKet | سەبەتەیەك کە لە قامیش یان توولی درەخت دروست کرابێت. |
| جوني، غضف | BiacK bellied | باڵندەیەکی جوانە لە کۆمەڵەی مریشك لە قەتێ ئەچێت |

| | | |
|---|---|---|
| جونية، قطا | Pterocles, sandgrouse | قەتێ ، باڵندەیەکی زەردی مەیلەو قاوەییە بە قەدەر کۆترێك دەبێت لە دەشت و بیاباندا دەژی دەغڵودان دەخوات. |
| جوهر | Principle, Element, Substance | نەژاد، بنەرەت، مادە. |
| جوهرة،درة | Gem, kperla, Jewel | گەوهەر، بلەخش، دوور، بەردێکی بە نرخ وەکوو دوڕ (مرواریی دەنک گەورە)و یاقووت و زمرووت و یاقیق. |
| جوهر البول، بولينا | Urea | (یوریا)جەوهەری میز، مادەیەکە لە میزدا هەیە. |
| جوهر (في الكيمياء) | Ingredient | نەژاد. |
| جو | Atmosphere | ١-(ئەتمۆسفێر)، تیوار، ڕەپۆش، هەوای دەوروپشتی زەویی. ٢-یەکەی پاڵەپەستۆ کە بریتییە لە ٧٦سم یان ٧٦٠ ملم. |
| جو، طقس | Weather | کەش، باری ئاوو هەوا لە شەو ڕۆژێکدا. |
| جوي، هوائي | Atmospheric Meteoric,airy | ئەتمۆسفێری، کەشی، هەوایی. |
| جويت، نيلة | Indigo | ١- چویت، ڕووەکێکە بەشێوەی گیا یان دەوەن ڕەنگێکی شین لە قەدو گەڵاکانی دەردەهێنرێت. ٢- چویت، نیل، ڕەنگێکی شینە ڕەنگی پێ دەکرێت. |
| جويفة | StinK-wort | ڕووەکێکی بۆگەنە. |
| جويسة، اسبرولة | Asperula, Mugwef, Woodruff | (ئەسپیرۆلا)، گیایەکە گوڵی سووریان شینی بۆخۆش دەگرێت، هەندێکیان بۆ ڕەنگ کردن بەکار دێن. |
| جويزة، جوزة صغيرة | Nutlet | گوێزۆکە، گوێزی بچووك. |
| جيارة | Lime-Kiln | کوورەی گەچ، کورەی قسڵ. |
| جياد، خيل الركوب | Saddlet-horse | ئەسپی سواریی، ئەسپی زین. |
| جيال الرهان، خيل الرهان | Race-horses | ئەسپی ڕەیسز، ئەسپی گرەو. |
| جيال ضبع،جعار حفصة، خزعل | Hyaena, Hyena | کەمتیار، گیاندارێکی درندەی شەو گەڕە، دەستی لە قاچی درێژترە لەبەر ئەوە پشتی بۆ دواوە لێژە پێستەکەی بەڵەکە لەسەر لاشەی تۆپیو دەژی. |
| جيب، جيب القميص | PocKet | گیرفان، بەریك، پێسیر، بەرۆك. |
| جيب تمام، جيب التمام | Cosine | ،(کۆساین)، گیرفانی تەواو،ڕێژەی ئەو لایەی تەنیشتی گۆشەکەیە، بۆ ژێر ژێی گۆشەکە |
| جيبون، كيبون | Gibbon | (گیبۆن)، مەیموونێکی گورج و گۆڵی بێ کلکی دەست درێژە. |
| جيب انفي | Nasal-sinus | گیرفانی لووت، توورەکەی لووت. |
| جيب وجني | CheeK-pouch, CheeK-sinus | گیرفانی کوڵم، بۆشایی کوڵم، تورەکەیەکە لە ڕوومەتی هەندێك گیانداردا خواردەمەنیی تیادا هەڵدەگرێت. |
| جيب هوائي | Air-pocket, Air-sinus | گیرفانی هەوایی، تەوژمێکی هەوایی ستوونییە دەبێتە هۆی خستنە خوارەوەی فڕۆکە. |
| جيب، جراب، كيس | Pouch, Sinus | گیرفان، توورەکە. |
| جيب الزاوية | Sine | (ساین)، گیرفان، گیرفانی گۆشە، ڕێژەی لای بەرامبەری گۆشەکە بۆ ژێی سێ گۆشەکە. |
| جيب جبهي | Frontal-sinus | گیرفانی ناوچەوان، بۆشایی ناوچەوان، بۆشاییەکی هەوایە بەستراوە بە بۆشایی لووتەوە لەژێر ئێسقانی ناوچەواندا. |
| جيب الجذير | Radicle-pouch | بەرگی ڕەگۆڵکە. |
| جيب تناسلي | Genital-sinus | توورەکەی ڕەگەزیی، گیرفانی زاووزێ. |

| | | |
|---|---|---|
| جيد | Good | باش، خاس، چاك، قەنج، رەند، كۆك. |
| جيد، رقبة، عنق | NecK | مل، ئەستۆ، گەردن، هەوك، ناق، خەن، حەفك. |
| جيدار | | رومەكێكە گەڵاكەی لە گەڵای بەڕوو دەچێت رەنگەكەی سوورە پێی دەوترێت قرمز. |
| جيرافيدي، زرافيات | Giraffedae | (جیرافیدا)، كۆمەڵەی وشتر بەڵەك و ئوكاپی. |
| جيروسكوب، دوار، دوام | Gyroscope | (جیرۆسكۆپ)، ئامرازێكە بۆ لەنگەرگرتن و دەرخستنی رێڕەوی فرۆكەو كەشتی بەكار دەهێنرێت بە كارەبا ئیش دەكات. |
| جيري | Calcareous, Limy | گەچیی، قسڵی، هەر مادەیەك كالسیۆم كاربۆنەیتی تیادابێت. |
| جيرمانيت | Germanite | (جیرمانیت)، یەكێكە لە كەرەسە خاوەكانی توخمی جێرمانیۆم رەنگەكەی سووری مەیلەو خۆڵەمێشییە لە باشووری ئەفریقا هەیە. |
| جير مطفا | SlacKed-lime | (كالسیۆم هایدرۆكساید)، قسڵاو، ئاوی قسڵ، قسڵی كوژاوە، قسڵی مردوو. |
| جيرانيوم، غرنوق، ابرة الراعي | Geranium, storKs-bill | (جیرانیۆم)، شەمەدان، جۆرە گیایەكە گوڵێكی بۆن خۆشی هەمە رەنگەی بە تایبەتیی سووری هەیە. |
| جيرحي، نورة | QuicK-lime | (كالسیۆم ئۆكساید)، قسڵ، ئابك، ئاژە، قسڵی زیندوو. |
| جير، جص | Lime | كلس، گەچ، قسڵ. |
| جيرنيوك | | بگەڕێرەوە بۆ (جرنك). |
| جيرارديا | GERARDIA, false-FOXGlOVE | (جیراردیا)، گیایەكی بچووكە گوڵەكەی سوور یان زەردە. |
| جيش | Army, troops | سوپا، لەشكر، ئۆردوو. |
| جيش، حلبة، فريقة | FenugreeK,Trigonella | شمڵی گیایەكە، لە سێ پەڕە دەچێت تۆوەكەی بۆنخۆشە بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت دژی كۆكەیە، هەروەها گیایەكەی بۆ لەوەڕ باشە. |
| جيشان | Boiling | كوڵان. |
| جيفة، جثة منتنة، رمة | Cadaver, carrion, Carcass | لاشەی بۆگەن، بۆگەن، بۆگەنیی، مندار، لاشەی مردوو، مردارەوەبوو. |
| جيفيات | Necrophagous | بۆگەن خۆر، ئەو لەو مێروانەی كە لەسەر شتی بۆگەن دەژین. |
| جيلارية | | (جیلاریا)، گیایەكە گوڵەكەی بەشێوەی هێشووی زەرد یان پرتەقاڵییە. |
| جيل، جرثومي | Sporophyte | (سپۆرۆفایت)، بەرەی سپۆریی، رووەكی سپۆریی. |
| جيليديوم | Gilidium | (جیلدیۆم)، قەوزەیەكی سوورە مادەی ئەگار لێ دەردەهێنرێت. |
| جيلاتي، دندرمة | Ice-Cream | ئایس كرێم، دۆندرمە، بەستەنیی. |
| جيل، عصر | Era, Epoch | سەردەم، سەدە. |
| جيل | Generaton, | نەتەوە، بەرە، نەوە، وەچە بەرەباب. |
| جيلاتين، هلام، بلوظة | Jelly, Gelating | (جەلاتین)، مادەیەكی پرۆتینیی لە ولوولە دەچێت بێ رەنگە لە شانەو ئێسقانی گیاندار دەردەهێنرێت. |
| جيلية | Gilia | (جیلیا)، گیایەكە گوڵی سپی یان سوور یان شین دەگرێت. |
| جيلينية | Gillenia, Bowmans, -root | (جیلینیا)، (رەگی بۆمانس)، رووەكێكە لە كۆمەڵەی گوڵەباخ گوڵی سپی دەگرێت، هەندێك دەرمان لە رەگەكەی دەردەهێنرێت. |
| جينكو، شجرة المعبد، معبلة،جنكة | GinKgo, Maiden-hair-tree | (جینكگۆ)، جینگۆ، (درەختی گژنیژی پیر)، درەختێكی گەورەیە بەرەكەی زەردو چەورە دەخورێت تەختەكەی سپیی و سووكە بۆ مەبەستی پیشەسازی بەكاردێت. |
| جينك، طائر الثلج | Snow-bird | (جینك)، زرە بولبول)، باڵندەی بەفر چۆلەكەیەكی ئەمریكیی خۆڵەمێشیی كۆچكەرە. |

| | | |
|---|---|---|
| جينكو | Corr ugated-iron, Galvanised-iron | (چينكۆ)،لەوحێكی ئاسن بە چینێكی تەنك لە توتیا (زینك) رووكەش كراوە بۆ ئەوەی كە ژەنگ هەڵنەهێنێت. |
| جين | Gene | (جـین)، گرێیەكەلەسـەر كرۆمۆسـۆم سـیفاتی زگمـاكیی دەگوێزێتـەوە لـە دایكو باوكەوە بۆ منداڵەكانیان. |
| جيهل، ميطان | Bos-frontalis ,Gayal | (بیسۆن)، (گایال) جۆرێكە لە مانگا كێویی هیندیی. |
| جيهمان، جادي زعفران، جساد | Saffron | زەعفـەران، رووەكێكـی سـەلكدارە، گوڵەكـەی زەردە، رۆنێكـی لـێ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشكیەو بەو هاڕراوەی گوڵەكەی بۆ مەبەستی پزیشكییو بۆنی خۆشو رەنگ كردن بەكاردێت. |
| جيهوف، بعر الفأر | Dung-of-mouse | گوومشك. |
| جيهر، جيهور | Sarcophila | جۆرە مێشێكە گۆشت خراپ دەكات. |
| جيوفيزياء، جيوفيزيقا | Geophysics | (جیوفیزیا)، فیزیای زەویی، فیزیای چینـەكانی زەویی، لقێكە لە زانیاریی باسـی خولانـەوەو پێكـهاتنو چـاڵو چۆڵـییو ئـاوو هـەواو كایـەی موقناتیسیو كارەبای خڕۆكی زەویی دەكات. |
| جيوكيميا | Geochemistry | (جیۆكیمیـا)، كیمیـای زەویـی، زانیارییەكـە باسـی پێكـهاتنی كیمیـایی توێكڵی زەویی دەكات لەگەڵ ئەو گۆڕانانەی كە بەسەریا دێت. |
| جيوديميتر | Geodimeter | (دێودیمـەتر)، دەزگایەكـە بـۆ پێوانـی مـاوەی نێوانـی دوو شـوێن بـەكار دەهێنرێت، وە بە شەپۆلی رووناكی ئیش دەكات. |
| جيولوجيا، جيولوجي، علم الأرض | Geology | (جیۆلۆجی)، زانیاریی زەویی، زەویی ناسین، زانیـاریی چینـەكانی زەوی لقێكە لەزانیاری باسی بنەڕەتو مێژوو پێكهاتنو سروشـتی كیمیـاییو فیزیایی زەوی دەكات. |
| جيولوجيا الكون | Cosmic- geolgy | جیۆلۆجیای گەردوون. |
| جيولوجيا تاريخية | Historical-geology | جیۆلۆجیای مێژووی. |
| جيولوجيا اقتصادية | Economic-geology | جیۆلۆجیای ئابووری. |
| جيولوجيا الصخور | Petro-geology | جیۆلۆجیای بەردەكان. |
| جيولوجيا ديناميكية | Dynamic geology | جیۆلۆجیای دینـامیكی، زانیاریی خوێندنی جوڵە جیۆلۆجیـەكانی وەكـوو بومەلەرزەو بوركان. |
| جيولوجيا المياه | Hydrogealogy | جیۆلۆجیای ئاو. |
| جيومورفولوجيا | Geomorphology | (جیۆمۆرفۆلۆجی)، زانیـاریی شـێوەی زەوی، خوێندنـی بنـەڕەتی زەویـیو دیاردە(ظاهرة) سروشتیەكانو توێكڵی زەوی. |
| جيولوجي | Geologist | زانا لـە چینـەكانی زەویـدا، زەویناس.ئەو زانایەیـە كە لـە باسـی بنـەڕەتو مێژوو و پێكهاتنی خڕۆكی زەوی دەكۆڵێتەوە. |
| جيوديسيا،مساحة | Geodesy | (جیودیسـی)، زانیـاریی رووبـەریی زەوی، لقێكـە لـە زانیـاریی بیركـاریی لەشێوەو پێوانی رووبەریی زەویی دەكۆڵێتەوە. |
| جيوديسي | Geodesic | (جیودیسیك)، بەشێك لە هێڵێكی چەماوە یان راست كە كورت ترین ماوە یان دووریی بێت. |
| جيوغرافيا، جغرافية | Geography | (جیۆگرافی) جوگرافیا، زانیاریی وێنەی زەویی، زەویی ناسیی. |
| جيوب انفية، جيب أنفي | Nasal-sinus | گرفـانی لـووت، بریتیـیـە لـە چـەند بۆشـاییەك لـە ئێسـقانی دەمو چاودابەسـترلون بـە بۆشـایی لووتـەوە، ئـەم بۆشـاییانە لـە نـاوەوە بـە پەردەیەكی تەنك داپۆشراون. |

| | | |
|---|---|---|
| جیوم، حشیشة المبارك | Geum, Avens | (ئەڤێنس)، (جیۆم)، گیای پیرۆز، گیایەکە گەڵاکەی ماددەی تفتی و ڕەسینی (جەوی) تیایە. گوڵەکەی سپی یان قەرخەوانی یان زەردە. |
| جیود | Geode | (جیۆد)، تۆپەڵە کانزای ناو بەرد، تۆپەڵێکی کانزایی بۆشە شێوەکەی خڕە لە نێوانی چینەکانی بەردە کلسیەکاندا هەیە، دیواری ناوەوەی بە کریستاڵی کالسایت یان سلیکا داپۆشراوە. |

| | | |
|---|---|---|
| حائل | Obstacle, Hindrance | قورت، كۆسپ. |
| حائش | Garden | باخ. |
| حائضة | Menstruous, menstruant | بێ نوێژ، ئافرەتی بێ نوێژ. |
| حائر، متحير | Perplexed | سەر لێشێواو، بێ دەرەتان، داماو. |
| حائط، جدار | Wall | دیوار، تیك، كۆسەر. |
| حائك | Knitter, Weaver | جۆلا، تەونكەر، كۆرسكەر. |
| حابلة، حبلي | Pregnant | سك پڕ، ئاوس، ئاڤس،دووگیان. |
| حابب | Granivorous | دان خۆر، تۆ و خۆر، هەر گیاندارێك یان باڵندەیەك كە تۆ و بخوات. |
| حابس الدم | Haemostatic | (هیموستاتیك)، دەرمانێك كە خوێن ڕژان بوەستێنێت. |
| حاج، عاقول | Camels-Thorn | وشترخوار، ڕووەكێكی دڕكاوییە بۆ لەوەڕ باشە. |
| حاجز | Septum | دیوار، پەردە، بەربەست. |
| حاجز | Diaphragm, barrier | كۆسپ، لەمپەر، پەردە. |
| حاجز غربالي، غشاء حيواني او نباتي | Sieve-membrane | بەربەستی بێژنگیی. |
| حاجز مسامي | Porous-septum | بەربەستێكی كون كون، بەربەستی كونیلەدار. |
| حاجز الأنف | Columna-nasi Internasal-septum | دیواری نێوانی هەردوو كونە لووت. |
| حاجز عرضي | Transverse-septum | بەربەستی پانایی. |
| حاجز صوتي | Sonic-barrier, sound-barrier | شوورەی دەنگ، بەربەستی دەنگ، پتربوونی بەرهەڵستی هەوا بەرامبەر بە فڕۆكەیەك كە خێرایییەكەی نزیك بوبێتەوە لە خێرایی دەنگ. |
| حاجز الأمواج | Waves-barrier | بەربەستی شەپۆل، بەربەستێكە لەبەردەمی بەندەرەكاندا دەكرێت بۆ ئەوەی بیانپارێزێت لە شەپۆلی ئاو. |
| حاجب، ساتر | Sheltering | پەردە. |
| حاجب العين | Brow, eyebrow | برۆ، برێی. |
| حاجر | Lithologist | (لیثولوجیست)، زانا بەرد، زانا، لە بنەڕەت و جۆر و شێوەی بەردەكاندا. |
| حاجور | DiKe | ئاوبارە، بەندی ئاو، بەستی ئاو. |
| حاجة، ضروري، اساسي، طلب ، سؤال | Request, Need | پێویستیی، ویستەمەنی، ئاتاج، ئیوو. |
| حاجبية، اوفريس | Ophrys | (ئوفریس)، ڕووەكێكە لە كۆمەڵەی سەعلەم گوڵێكی سەیری هەیە لە مێش و هەنگ دەچێت. |
| حاحب، عاصفة | Tempest, violent-storm | ڕەشەبا، بایەكی بەهێزە خۆڵ و چەو لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێت. |
| حادث طاريء | Accident | ڕووداوی كوتوپڕ. |
| حادلة بخارية، وابور الزلط | Steam-roller | مەكینەی باگردێن، باگردێنی هەڵمیی، مەكینەی زەویی تەخت كردن. |
| حادلة، محدلة | Roller, stone-roller | باگردێن، بانگردێن، باگردان، بانتلێن، بانگەڕ. |
| حادلة الثيل | Mowing-roller | باگردێنی چیمەن، مەكینەی چیمەن. |
| حادل | | بانگوش، بانگێر. |
| حادثة | Event | ڕووداو، بەسەرهات، سەربهورد. |
| حاد المزاج، حاد الطبع | Hot- tempered | تورەو تڕۆ، جینگر، ڕابەل، خوێن گەرم. |

| | | |
|---|---|---|
| حاد الذهن | Sharp-witted | بیرتیژ. |
| حاد (للآلة) | Sharp | تیژ، کڕ. |
| عاد، حریف(للطعم) | Acrid | تون، تیژ. |
| حاد البصر، حاد النظر | Sharp-sighted | چاوتیژ. |
| حادي عشر | Eleventh | یازدەهەم. |
| حاذق، ماهر، حذق | SKilful | دەست سووک، بەهرەمەند، شارەزا، بە سەلیقە، زیخ، کاریین، زیت. |
| حاذق، حامض، رائب | Sour | ترشاو، هەر شلەیەك بەرەو ترشانو بۆگەن بون بڕوات. |
| حار | Hot, Warm | گەرم. |
| حار، حریف | Pungent | توون، تیژ، کەسکون. |
| حار الدم، ذو دم حار | Warm-blooded | خوێن گەرم، ئەو گیاندارانەی کە پلەی گەرمی لەشیان ناگۆڕێت لە باری ئاساییدا وەکوو شیردەرەکان. |
| حارة، حي، زقاق | Lane, alley | کۆڵان، تاخ، کوچە، گەرەك، |
| حارة | Rapistre | (راپیستەر)، گیایەکی دەشتەکییە گوڵەکەی زەردە. |
| حارود، بادستر، قندس، کستور، بیدستر | Castor, Beaver | سەگلاو، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەری ئاوییە کلکی پانە لەناو گەڵیدا دوو جووت توورەکەی پێوەیە، یەکەمیان مادەیەکی بۆگەن دوومیان مادەیەکی بۆن خۆش دەردەدات. |
| حارث | Plough-man | جووتیار، وەرزێر، بکێڵ. |
| حارس | Guard-watchman | پارێزەر، زەیدەوان،زێوان، پاسەوان، یاساوڵ. |
| حارس اللیل، خفیر،دیدبان، ناطور | Guard , sentry | ئێشکچی، چەرخەچی، ئێشکگان، پاسەوان،یاساوڵ، حەس حەس. |
| حارس السماء، رامي | Sagittarius | تیرەنداز، تیرئەنداز، جۆرە ئەستێرەیەکە. |
| حارس،ابو منجل، (ابو حنش، عنز الماء | Ibis | داسولکەدار، مەلە داسولکە، باڵندەیەکی لاق درێژە لە قەراخ ئاودا دەژی دەنووكو مل و لاقی پانە دەنووکی درێژو چەماوەیە بۆ خوارەوە لە داسولکە دەچێت. |
| حارق | Canine-tooth-of lion | ددانی شێر. |
| حارك، حاروك، | Withers, Arctic-duck | سەرووی پشتی ولاخ، ناوشانی ولاخ. |
| حاروش، حارش، مرض الفطر الشعاعي | Actinomycosis | (ئەکتینومایکوسیس)،نەخۆشییەکە تووشی دەمو چاوی (زمانو روومەتو قورگ)ی ئاژەل دەبێت بە هۆی کەڕووەوە دادەکەوێت. |
| حاریة، حیة قرناء | Cerastes, Horned-Viper | ماری شاخدار، رەنگەکەی قاوەیی و مەیلەو زەردە لە بیاباندا دەژی. |
| حازوقة، حزوقة، فواق، زغطة، شهقة، فهقة | Hiccough | نزگەرە. |
| حاسة | Senseorgan | هەست، هەستە، هۆش، خود هەستیار، هەستکار، ئەندامی هەست کردن وەکوو چاو. |
| حاسة البصر | Sight, eyesight | سۆمای چاو، هەست کەری بینین، هەستیاری بینین، هەستی بینین. |
| حاسة الشم | Olfactory-sense, Osphresis | هەست کەری بۆنکردن، هەستیاری بۆن کردن، هەستی بۆن کردن. |
| حاسة الذوق | Taste | هەست کەری چێشتن، هەستیاری چەشتنو تام کردن، هەستی چەشتن. |
| حاسة اللمس | Sense of touch, tactual-Sensivity | هەست کەری دەست لێدان، هەست کەری پێستیی، هەستی بەرکەوتن، هەستیاری پێست،هەستی دەست لێدان، هەستی لێکەوتن. |

| | | |
|---|---|---|
| حاسة السمع | Sense of hearing | هەست کەری بیستن، هەستیاریی بیستن، هەستی بیستن. |
| حاسبة | machine, computer Calculating | ژمێرەر، چورت، مەکینەی ژماردن. |
| حاسبة الكترونية، عقل الكتروني | Electronic-Computer | (کۆمپیوتەر)، ژمێرەری ئەلیکترۆنی، ژمێریاری ئەلەکترۆنی، ئامرازێکی ئەلیکترۆنی ئۆتۆماتیکیە، بۆ چارەکردن یان شێکاری گیروگرفتی ماتماتیکی(بیرکاری) زۆر زەحمەتی ئەوتۆ دروستکراوە کە شێکارەکەی وەختێکی یەکجار زۆری دەوێت. |
| حاسر الرأس، عاري الراس | Bare-headed | سەرقوت، سەرڕووت. |
| حاسر البصر | WeaK-eyed | چاوکز. |
| حاسم، بات | Decisive | تەواو، بێ پەشیمانی. |
| حاشا، سعتر فارسي | Headed-thyme | جاترەی فارسی، جۆرێکە لە جاترە گوڵەکەی پەمبەییە رۆنێکی بۆنخۆشی لێ دەگیرێ، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| حاشات | Phalangidae | (فالانجیدا)، جۆرێکە لە جاڵجاڵۆکە. |
| حاشية | Edge, Border | پەراوێز، چمك، کەنار، دەرکەنار،شیرازە، دامێن، داوێن، بن تیك. |
| حاشية، حشم | Attendants | دەست و پێوەند، دەس و پێوەنگ، دەوروپشت. |
| حاشية الكتاب، هامش | Margin | کەنار، دەرکەنار،دامێنی لاپەڕەی کتێب. |
| حاشية الثوب، هدب ١ | Edging, hem | دامێنی کراس، ڕێشووی کراس، دەمەمەن. |
| حاشر | Insectivorous | مێروو خۆرەکان، هەر گیاندارێك کە مێروو بخوات. |
| حاشية القماش، برصل | Selvage | قەراغی قوماش. |
| حاشور | Insect-destroying | دەرمانی مێش و مەگەز، دەرمانی مێروو قەلاچۆکردن. |
| حاصد، حصاد | Mower, Reaper, Harvester | سەپان، درەوەنی ، وەرزێر، گۆخل، درونەکەر،پالە، دەرەوان. |
| حاصدة | Reaping-machine | درونەکەر، مەکینەی درونە. |
| حاصة، داء الثعلب | Alopecia, Baldness Fox-evil | مووڕزە، تووك هەڵ وەرین، نەخۆشی ڕێوی، مووڕێژە، مووڕژە. |
| حاصل الجمع | Total, Sum | ئەنجامی کۆکردنەوە. |
| حاصل الضرب | Product | ئەنجامی لێکدان، سەرئەنجامی لێکدان. |
| حاصل القسمة، خارج القسمة | Quotient | ئەنجامی، دابەش بوون، ئەنجامی بەسەرا دابەشکردن. |
| حاصل الأذابة | Solubility-product | ئەنجامی تواندنەوە،سەرەنجامی تواندنەوە. |
| حاصل ايوني | Ionic-production | ئەنجامی ئایۆنیی. |
| حاصل الذكاء | Intellingence-product, Intelligence-quotient | سەرەنجامی زیرەکیی، تەمەنی مێشکیی، ئەنجامیی زیرەکیی، ماناکەی ئەنجامی دابەشکردنی تەمەنی ژیریی کەسێك بەسەر تەمەنی وەختیی و لە (١٠٠) لێکدرابێت. |
| حاصلات | Produce | بەروبووم. |
| حاصل، حصيلة | Retsult | سەرەنجام، ئەنجام، سەرئەنجام. |
| حاصود، مقضب، محش | Scythe | داسی گەورە بۆ درونە. |
| حاضر الذهن، حاضر البديهة | Ready-witted | بیرتیژ. |
| حاضر | Ready, present | ئامادە. |
| حاضرة، عاصمة | Capital | پایتەخت. |
| حاضنة | Nurse | دایەن، لەلە، دایان. |

| | | |
|---|---|---|
| حاضن، راخم،رنقاء | Brooding-hen | مریشکە بە کڕ، مریشکا بکورك. |
| حاضنة | Incubator | مەکینەی جوجەڵە، مەکینەیەکە گەرمی‌یەکی تایبەتی ئامادە دەکات بۆ هەڵهێنانی جوجەڵە لە هێلکە بە شێوەیەکی دەستکرد. |
| حافر | Hoof, ungula | سم، پاقولاخ، سمی وڵاخ. |
| حافرات، منجحرات | Orycteropidae | (ئۆریکترۆپیدا)، کۆمەڵە گیانداریکی بێ ددانن وەکوو بەرازی زەوی. |
| حافرية، مرموزة | Calceolaria | (کالسیۆلاریا)، گولسم، ڕووەکێکە گوڵەکەی لە سمی وڵاخ دەچێت. |
| حافري، ذو حافر، ذو ظلف | Hoofed solipad, Ungulata, perissodactyla | سمدار، گیانداری سمدار وەکوو ئەسپ. |
| حافر الحمار، محار كبير | Spondylus | جۆرە لەپکەیەکی(گوێچکەماسییەکی) گەورەیە. |
| حافز، باعث | Mobile, Moving | هاندەر، ڕاپەڕێنەر. |
| حافة | Edge, Border, Margin | قەراغ، لێوار، کەنار، ڕۆخ، تەنیشت. |
| حافة الثوب | Hem of the suit, edge of the suit | چاك، چمك. |
| حافة السطح | Hem of the roof, edge of the roof | گوێ سوانە، گوێ سەوانە، گوێ سوانکە. |
| حافي، حافي القدمين | Bare-Foot | پێ خاوس، پێ‌پەتی، پێ‌خواس، پاپەتی. |
| حافلة كهربائية | Tram, Tramway | تراموای،بریتی‌یە لە دەزگایەکی کارەبایی بۆ ڕاکێشانی فارگۆنی (گالیسکە)ی گواستنەوەی مرۆڤ بەسەر هێڵی ئاسنیندا لەناو شەقامی شارەکاندا. |
| حافظ، واق | Keeper, protector | ئاگادار، پارێزەر. |
| حافظ | Preservative | پارێزەر، مادەیەکی کیمیایە دەکرێتە خواردەمەنیی قوتوومەوە بۆ ئەوەی کە بۆگەن نەکات. |
| حافظة، ذاكرة | Memory | زەین،بیر،یاد. |
| حافظة | Protector of fuse | لەخفووری فیوز. |
| حافظة، حافظة المغناطيس | Armature | بەرکەوتە، بریتی‌یە لە پارچە پۆلایەك لە زەنگی کارەبادا بەهۆی موگناتیسەوە کار دەکات. |
| حافظة نباتية | Herbarium | فایلی ڕووەکی، فایلێکە گیای وشککراوەی تیا هەڵدەگیرێت بۆ مەبەستی خوێندن‌و پاراستن. |
| حاقول | | ماسییەکی سەوزی درێژە. |
| حاكي | Narrator, Teller | قسەکەر، گێڕەرەوە، چیرۆکبێژ. |
| حاكي، غرامافون | Phonograph, Gramaphone | سنوق گۆرانیی. |
| حاكم، والي | Ruler, governor | دادمەند، دادپرس، دادکار، فەرمانبەر. |
| حاكم، قاضي | Judge | قازی. |
| حاكم | Governer | ڕێکخەر، ئامرازێکە بۆ ڕێکخستنی خێراییی ئامرازی جووڵاندن. |
| حال،نورج، دراسة | Threshing-Machine, dragnet | مەکینەی گێرەکردن. |
| حالة، حال | State, Case, manner | دۆخ، بار، وار چۆنێتیی، مەرە. |
| حالة النزع، سكرة الموت | Agony | گیانەڵا، سەرەمەرگ. |
| حالة طبيعية | Natural-state | دۆخی سروشتیی. |
| حالة بخارية | State vaporous | دۆخی هەڵمیی. |

| | | |
|---|---|---|
| حالة التوازن | Equilibrium state | دۆخی لەنگەرگرتن، دۆخی هاوتایی، باری هاوسەنگی، دۆخی تەرازوومەندی. |
| حالة غازية | Gaseous-state | دۆخی گازیی. |
| حالة سائلة | Liquid-state | دۆخی شلیی. |
| حالة صلبة | Solid-state | دۆخی رەقیی. |
| حالة جينية | Genotype | باری جینیی، کۆمەڵەی کارکەرە زگماکیەکان لە کەسێکدا. |
| حالا | At once | دەست بەجێ خێرا، یەکەن دەردوو، تاڵ. |
| حالق(حوالق)، عطفة | Tendril | تەرز، وەکوو تەرزی مێو، بەهۆی ئەو تەرزەوەداری مێو خۆی دەئاڵێنی بە دارو رووەکی ترەوە. |
| حالق الشعر، فاشرا بيضاء | White- bryony | گیایەکە لە کۆمەڵەی کولەکە کەلاکەی گەورەو تووکن و بۆگەنەگوڵەکەی سپیە بەرەکەی بچوك، زەرد یان رەش یان سوورە، رەگەکەی جۆرە نیشاستەیەکی لێ دەردەهێنرێ. |
| حالب،حالب البول | Ureter | میزدۆش، ئەو بۆرییەیە کە میز لە گورچیلەوە دەبات بۆ میزڵدان، دۆشەری میز. |
| حالب الشلغ، حالب المنى | Vas-deferens, Canal-deferent | بۆریی سپێرم، دۆشەری سپێرم، ئەو بۆرییەی کە ئاوی نێری پیا دێتە دەرەوە لە چووکدا. |
| حالوب، برد | Hail | تەرزە، تەزرە، تەگەر، تەگەرگ، گلێرە، گژك، تەوەرگ، خڕخڕۆك، تەیرۆك، تەرگ، گارپیەسۆك، زیپ،گژلۆك، بەرخورك. |
| حالوط | Root- rot | دەردەرەگ، کەڕوە رەگ، جۆرە گەڕوویەکە دەدات لە رەگ و قەدی رووەك. |
| حالك | Pitch, darK | تاریك، شەوەزەنگ. |
| حالوم، حلوم | Cream-cheese, Cottage-Cheese | لۆرك، پەنیری سپی. |
| حالوم، شنجبار مخزني، حبة القلب | Common-gromwell | (گرۆمویل)، دەنکی دڵ، تۆوی دڵ، جۆرە رووەکێکە گوڵەکەی پەمبەییە تۆوەکەی بۆ میزکردن باشە. |
| حالوش، مالوش، حفار | Mole-cricKet | ملە، هۆڵە، جۆبرکە، قوزبڕکە، مێرووییەکی زیان بەخشە لە کۆمەڵەی کوللە لەژێر زەویدا رەگ و قەدی رووەك دەخوات. |
| حامضي | Acidic | ترشیی، ترشاویی. |
| حامض | Sour, Acid | (ئەسید)، ترش، ترشەڵۆك، ئاوێتەیەکی ترشە لە گیراوەی ئاویدا ئایۆنی هایدرۆجین دەدات و رەنگی کاغەزی گوڵەبەرۆژە سوور دەکات، ئەگەر هایدرۆجینەکەی بگۆڕێتەوە بە میتاڵ دەبێت بەخوێ. ترش دوو جۆرە:-<br>١-ترشە کانزاییەکان: وەکوو ترشی نایتریك، ترشی سولفەریك.<br>٢-ترشە ئۆرگانیکیەکان: وەکوو ترشی ئەسیتیك، ترشی ئۆکزالیك. |
| حامظ الخليك الثلجي | Glacial-acetic-acid | (گلاشیال ئەسیتیك ئەسید)، ئەسیتیك ئەسیدی بەفریی، سرکەی بەفری، کریستاڵی ئەوتۆ پێك دەهێنێت کە لە بەفر دەچێت لە پلەی ٦و١٦س دا دەتوێتەوە. |
| حامض الخليك | Acetic-acid | (ئەسیتیك ئەسید) ترشی سرکە، ترشەڵۆکی ئەسیتیك، شلەیەکی بێ رەنگی ترشە لە سرکەدا هەیە بۆ مەبەستی پزیشکی و پیشەسازی بەکاردێت. |
| حامض النتريك، حامض الأزوتيك | Nitric-acid, Azotic-acid | (نیتریك ئەسید)، (ئازۆتیك ئەسید) تێزاب، ترشی نیتریك، ترشێکی زۆر بەهێزە بۆ ئۆکساندنی مادەکانی تر بەکاردێت، لە دروست کردنی ئاوی شایانەدا(الماء الملكي) بەکاردێت بۆ تواندنەوەی زێڕ و پلاتین. |

| | | |
|---|---|---|
| حامض الكبريتيك | Sulfuric-acid | (سەلفریك ئەسید)، ترشی كبریتیك شلەیەكی بێ رەنگە دیمەنەكەی چەورە، مادەیەكی وشككەرەوەیە لە پاككردنەوەی نەوتی سرووشتیو دروستكردنی تەقەمەنیو پەینو رەنگدا بەكاردێت. |
| حامض الكبريتيك | Oleum | ترشی كبریتیكی دووكەڵاویی. |
| حامض الكاربونيك | Carbonic-acid | (كاربۆنیك ئەسید)، ترشی كاربۆنێك، ترشێكی بێ هێزە لە ئەنجامی تواندنەوەی گازی كاربۆندایۆكساید واتە (دوەم ئۆكسیدی كاربۆن) لە ئاودا پەیدا دەبێت. |
| حامض اشني | Orsellic-acid | (ترشی ئورسیلیك)، ترشی قەوزە،كریستاڵێكی دەرزیلەیی بێ رەنگو بێ بۆنی تاڵە لە قەوزەدا هەیە. |
| حامض انجزاني | Ferulic-acid | (فیرولیك ئەسید)، ترشی فیرۆلیك كریستاڵێكی دەرزیلەیی بێ رەنگو بێ بۆنە لە روەكێك دەردەهێنرێت پێی دەوترێت (ئەسافویتیدا)، (واتا روەكی كاشمە یان هەنگوان یان بەرەژە). |
| حامض البوريك | Boric-acid | (بۆریك ئەسید)، ترشی بۆریك، مادەیەكی رەقی سپیە، لە بۆراكس دروست دەكرێت بۆ دەرمانی چاو بەكاردێت. |
| حامض كابلي، حامض اهليلجي | Chebulic-acid | ترشی كابوولیی، بەشێوەی كریستاڵی بێ رەنگ لە روەكی تیرمینالیا(اهلیلج) دەردەهێنرێت. |
| حامض الفوسفوريك | Phosphoric-acid | (فۆسفۆریك ئەسید)، ترشی فۆسفۆریك، شلەیەكی خەستی بێ هێزە، لە ئامادەكردنی پەینی فۆسفەیتیی دا بەكار دەهێنرێت. |
| حامض الأورثو فوسفوريك | Ortho-phosphoric-acid | ترشی ئۆرسۆ فۆسفوریك:-جۆرێكە لە ترشی فۆسفۆریك. |
| حامض الميتافوسفوريك | Meta-phosphoric-acid | ترشی میتا فۆسفۆریك، ئەگەر فۆسفرەس پێنتۆكساید(پێنجەم ئۆكسیدی فۆسفۆر) بخرێتە بەر هەوا ئەم ئەسیدەی لێ پەیدا دەبێت. |
| حامض البيرو فوسفوريك | Pyro-phosphoric-acid | ترشی پیرو فۆسفۆریك، لە گەرم كردنی ترشی فۆسفۆریك پەیدا دەبێت، بەشێوەی كریستاڵی بێ رەنگ هەیە. |
| حامض الهيدروكلوريك، ماء النار | Hydro-Chloric- acid | (هایدرۆكلۆریك ئەسید)، ترشی هایدرۆكلۆریك، لە تواندنەوەی گازی هایدرۆجین كلۆراید لە ئاودا پەیدا دەبێت لە دروستكردنی سرێشو شەكر (لە نیشاستەدا بەكاردێت). |
| حامض الكبريتوز | Sulphurous-acid | (سەلفەرۆز ئەسید)، ترشی گۆگردۆز، لە تواندنەوەی سولفەر دایۆكساید(دوەم ئۆكسیدی گۆگرد) لە ئاودا پەیدا دەبێت. |
| حامض النتروز | Nitrous-acid | (نیترۆز ئەسید)، ترشی نیترۆز بە شێوەی شلەیەكی ناجێگیری شینی كاڵ هەیە. |
| حامض البركلوريك | Perchloric-acid | (پێركلۆریك ئەسید)، ترشی پێركلۆریك، شلەیەكی دوكەڵداری بێ رەنگە، مادەیەكی ئۆكسێنەری بەهێزە زیان بە پێست دەگەیەنێت. |
| حامض البكريك | Pecric-acid | (پیكریك ئەسید)، ترشی پیكریك، بۆ تیماركردنی سووتاویو رەنگ كردن بە زەرد بەكاردێت. |
| حامض البيروكبريتيك | Pyroculphuric-acid, Fuming-sulphuric-acid | (بكرونویل)،(پیرۆسەلفریك ئەسید ترشی پیرۆ كبریتیك، سەلفریك ئەسیدی دوكەڵدار، بریتیە لە تواوەی سولفەر ترایۆكساید (سێهەم ئۆكسیدی گۆگرد)لە سولفەریك ئەسیدی پەیتدا. |
| حامض السيليسيك | Silicic-acid | (سیلیسیك ئەسید) ترشی سیلیسیك، بریتیە لە تۆپەڵێكی جەلاتینی، خێرا جیا دەبێتەوە بۆ ئاو و سلیكا. |

| | | |
|---|---|---|
| حامض التارتاريك، حامض الطرطريك | Tartaric-acid | (تارتاريك ئەسيد)، ترشى تارتاريك، ليمۆندوزى كە دەكرێتە چێشتەوە بۆ ترش كردنى. |
| حامض الهايبو كلوروز | Hypochlorous-acid | (ترشى هايپۆكلۆرۆز)، ترشێكى لاوازە خێرا شى دەبێتـەوە. لـە ئـەنجامى تواندنەوەى (كلۆرين مۆنۆكسايد) واتا يەكەم ئۆكسيدى كلۆر لە ئاودا پەيدا دەبێت. |
| حامض الأنجليك | Angelic- acid | (ترشى ئـەنجيليك)، كريستاڵێكى دەرزيلـەيى بـێ رەنـگو بۆنـە لـە رەگـى هەندێك رووەك دەردەهێنرێت. |
| حامض العنبر، حامض عنبري | Succinic-acid | (ترشى سەكسينيك)، ترشێكە لە عەمبەرو جەوييدا هەيە. |
| حامض أميني | Amino-acid | (ئـەمينۆ ئەسيد)، ترشـى ئـەمينى، رەگـى (ئـەمينۆى) تفـتو كاربۆكسـيلى ترشى تێدايە. |
| حامض اللكتيك، حامض اللبنيك | Lactic-acid | (لاكتيك ئەسيد)، ترشى لاكتيك، لە ماستدا هەيە. |
| حامض الستريك، حامض الليمونيك، حامض الليمون | Citric-acid | (سيتريك ئەسيد) ترشى سيتريك، ترشەڵۆكەيە كە لە ميوەى ترشى وەكوو پرتەقاڵو نارنجو ليمۆدا هەيە، ترشەڵۆكى ليمۆ. |
| حامض الأولئيك، حامض الدهنيك، حامض الزيتيك | Oleic-acid | (ئۆليئيك ئەسيد)، ترشى ئوليئيك، لە مادەى رۆنو چەوريدا هەيە. |
| حامض البالميتيك | Palmitic-acid, palmic-acid | (پاڵميتيك ئەسيد)، ترشى پاڵميتيك، مادەيەكى ترشەڵۆكە لە رۆنى خورماو بەزو پيودا هەيە. |
| حامض النمليك، حامض الفورميك | Formic-acid | (فۆرميك ئەسيد)، ترشى فۆرميك ئاوێتەيەكە لـە هێدرۆجـينو ئۆكسـجينو كاربۆن پێكهاتووە، شلەيەكى بێ رەنگە، بۆنێكى تيژى هەيە لە دڵۆپاندنى مێروولە دەردەهێنرێ. |
| حامض العفصيك، حامض الگاليك | Gallic-acid | (گاليك ئەسيد)، ترشى گاليك، ترشەڵۆكى مازوو، لە جەوت( كـڵاوى بەرو)و مازوو چايىو هەندێ رووەكى تردا هەيە، مادەيەكى دەباخ كەرە. |
| حامض الحندقوق | Melliotic-acid | (ترش ميليلۆتيك)، ترشێكى بۆنخۆشە لە كنێر دەردەهێنرێت. |
| حامض الخريق | Weratric-acid | (ڤيراتريك ئەسيد)، ترش خەريەنگ، ترشەڵۆكێكە لە خەريەنگ دەردەهێنرێت. |
| حامض الساليسليك، حامض الصفصاف | Salicylic-acid | (تـرش ساليسـليك)، مادەيـەكى رەقـى بـێ رەنگـە بـۆ دروسـت كردنـى ئەسـپرينو مەرەكـەب بەكار دەهێنرێت، لـە ئـاوگى درەخـتى بـىو رەگـى وەنەوشە دەردەهێنرێت. |
| حامض الأكريليك | Acrylic-acid | (ترش ئەكريليك)، ترشێكە خێرا كار لێك دەكات بۆنەكەى لە بۆنى سركە دەچێت. |
| حامض الستياريك | Sctearic-acid | (ترش ستياريك)، مادەيەكە لـە چەوريو پيـودا هەيـە بەشـێوەى تۆزێكـى سپى، لە ئاودا ناتوێتەوە بەڵكوو جيا دەبێتەوە. |
| حامض النيكوتينيك، نياسين | Nicotinic-acid | (ترش نيكوتينيك)، بەشێوەى كريستاڵى دەرزيلەيى لە گەڵاى توتندا هەيە، دژى نەخۆشى پلاگرا بەكاردێت. |
| حامض الهيدروسيانيك، حامض السيانذريك، حامض البروسيك | Hydrocyanic-acid, Cyanhydric-acid | (ترش هايدرۆسيانيك)، ئاوێتەيەكە لە ئۆكسـجينو هايدرۆجينو نترۆجينو كاربۆن پێكهاتووە، شلەيەكى ژەهرە لە پلەى (٢٦)ى سەديدا دەكوڵـێ، لە بادەمى تاڵ هەيە،بەشێوەيەكى يەكگرتوو لەگەڵ مادەى تردا، گازەكەى لە جەنگدا بەكار دەهێنرێت دەبێتە هۆى هەناسەگيران گازێكى بى رەنگە بۆنى بادەمى لێ دێت. |
| حامض السيانيك | Cyanic-acid | (ترش سيانيك)، شلەيەكى بێ رەنگى سووتێنەرە زوو دەبێت بە هەڵم. |
| حامض اليوريك، حامض البوليك | Uric-acid | (ترش يۆريك)، ترشى ميز، مادەيەكى سروشتىيە لەميزدا هەيە. |

| | | |
|---|---|---|
| حامض الأكونيتيك | Aconitic-acid | (ترش ئەکۆنیتیك)، بەشێوەی کریستاڵی بێ ڕەنگو بۆن لە لاسکی گەنمەشامیی و سلقدا هەیە. |
| حامض الخردل | Erucic-acid | (ترش ئیرۆسیك)، ترش خەرتەلە، کریستاڵێکە لە تۆوی خەرتەلەو شێلم دەردەهێنرێت. |
| حامض الأوكزاليك | Oxalic-acid | (ترش ئۆکزالیك)، ئاوێتەیەکە لە کاربۆنو هێدرۆجینو ئۆکسجین پێك هاتوە،مادەیەکی کریستاڵی سپییە لە پلەی (١٠١)ی سەدیدا دەتوێتەوە، لە ئاردی تەختەو پۆتاسیۆم هایدرۆکساید دروست دەکرێت. |
| حامض الأغاريسيك، حامض غاريقوني | Agaricic-acid | (ترش ئەگاریسیك) بەشێوەی کریستاڵی زیویی هەیە لە ڕووەکی تایبەتیدا. |
| حامض الأبيتيك | Abietic-acid | (ترش ئەبیتیك)، لە زەمقی درەختی سنەوبەر دەردەهێنرێت. |
| حامض الفيروليك | Ferulic-acid | ترشی فیرۆلیك، بەشێوەی کریستاڵی دەرزیلەیی هەیە لە ئەلکهولو ئاوی گەرمدا دەتوێتەوە. |
| حامض الماليك، حامض التفاحيك | Malic-acid | (ترش مالیك)، ئاوێتەیەکە لە کاربۆنو هێدرۆجینو ئۆکسجین پێکهاتوە، ترشە لە میوەی نەگەییوی وەکو سێودا هەیە. |
| حامض كاربوليك، حامض الفينول، حامض الفينيك | Carbolic-acid, phenol | (ترش کاربۆلیك)، (فینۆل)، (فەنیك ئەسید) ئەسەفەنیك، ئاوێتەیەکە لە کاربۆنو هیدرۆجینو ئۆکسجین پێك هاتووە، مادەیەکە بەشێوەی کریستاڵی بێ ڕەنگ، یان شلەیەکی مەیلەو ڕەش، لە دڵۆپاندنی قەترانی خەڵوزی بەردین دەردەهێنرێتو بۆ پاککردنەوەی ئاودەستو ئاومال بەکار دەهێنرێ دژی میکرۆب،بۆنێکی تیژی هەیە. |
| حامض الأديبيك | Adipic-acid | (ترش ئەدیپیك)، ترشێکە لە ڕۆنو چەوریدا هەیە. |
| حامض عضوي | Organic-acid | (ترش ئۆرگانیکی)، ئەو ترشەی کە جاران تەنها هەر لە لەشی زیندەوەر (گیاندارو ڕوەك) دەردەهێنرا، بەڵام ئێستاکە دروستیش دەکرێت. |
| حامض غير عضوي | Inorganic-acid | ترش، نائۆرگانیکی واتا کانزایی. |
| حامض الخشخاش | Meconic-acid | (ترشی میکۆنیك)، بەشێوەی کریستاڵی بێ ڕەنگو بۆن لە خاشخاش دەردەهێنرێت. |
| حامض التنيك، حامض التانين، حامض الگالوتانين | Tannic-acid | (ترش تانیك)، مادەیەکی بێ ڕەنگە لە ئاودا دەتوێتەوە، تاڵە،لە زۆر درەختدا هەیە بە تایبەتی لە کڵاوی بەڕوو، ترشی سماقو چاییدا، بۆ پێستە دەباغ کردن بەکار دەهێنرێ. |
| حامض قلوي | Amphoteric-acid | (ترش ئەمفوتیریك)، ترشو تفت ئەو ئاوێتەیەیە کە لەگەڵ ترشیو تفتیشدا کار لێك دەکات. |
| حامض الهيبوريك، حامض خيلي | Hippuric-acid | (ترشی هیپوریك)، ترشێکی ئۆرگانیکییە لە میزی وڵاخدا هەیە، کەمێك ترشە، لە هایدرۆجینو بۆرۆنو ئۆکسجین پێکهاتووە، لە ئاودا دەگیرێتەوە بۆ دەرمانی چاو. |
| حامض اللينوليك | Linolic-acid | (ترشی لینۆلیك)، ترشێکە لە ڕۆنی کەتاندا هەیە. |
| حامض الغلوتاميك | Glutamic-acid | (ترش گلوتامیك)، ترشێکە بەشێوەی کریستاڵ لە دۆشاوی چەوەندەر دەردەهێنرێ. |
| حامض الكروميك | Chromic-acid | (ترش کرۆمیك)، لە دروست کردنی لاستیكو قوماشو ڕوکەش(مطلي) شووشەی سیرامیکدا بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| حامض البنزوئيك، حامض البنزويك، حامض الجاويك | Benzoic-acid | (ترش بەنزۆيك)،ناوێتەيەكە لە كاربۆن و هيدرۆجين و ئۆكسجين پێكهاتووە،پلەی توانەوەی (١٢١)ی سەدييە، پلەی كوڵاندنی (٢٥٠) ی سەديی، شلەيەكيی بێ ڕەنگە لە جەويی درەخت دەردەهێنرێت. |
| حامض احادي القاعدة | Monobasic-acid | ترشی تاك تفت، وەكوو ترشی هايدرۆكلۆريك. |
| حامض ثنائي القاعدة | Mibasic-acid | (ترشی جووت تفت)، وەكوو ترشی كبريتيك. |
| حامض ثلاثي القاعدة | Tribasic-acid | ترشی سێ تفت: وەكوو ترشی فۆسفۆريك. |
| حامض الهيدرفلوريك | Hydroflouric-acid | (ترش هايدرۆفلۆريك)، بۆ نەخش كردن لەسەر شووشە بەكاردێت. |
| حامض الكافور | Camphoric-acid | (ترش كامفۆريك)، ترشێكە لە كافور دەردەهێنرێت بۆ دروست كردنی دەرمان و سليلۆيد(باغە) بەكاردێت. |
| حامض الأنتيمونيك | Antimonic-acid | (ترش ئەنتيمۆنيك)، مادەيەكی نيشتووی سپييە. |
| حامض النخليك، حامض البالميتيك | Palmitic-acid | (ترش پالميك، ترش پالميتيك)، بەشێوەی كريستاڵی دەرزيلەيی لەبەری خورمای ڕۆن دەردەهێنرێ. |
| حامض الأسكوربك، حامض اسقربوطي | Ascorbic-acid | (ترس اسكۆربيك)، فيتامين (c يان P يان G ) لە ميوەی ترشدا هەيە، دژی نەخۆشی (ئەسقەربوت) بەكار دەهێنرێت، ئەم نەخۆشی‌يە بريتييە لە ڕژانی خوێن لە پووك و ناوەوەی ددان و جومگەكانەوە. |
| حامض الكومريك | Coumaric-acid | (ترس كۆماريك)، كريستاڵی بێ ڕەنگە، لە ڕەگی ڕووەكی كنێر دەردەهێنرێت. |
| حامض الغليكوليك | Glycollic-acid | (ترش گليكۆليك)، بەشێوەی كريستاڵی بێ ڕەنگ لە بەرسيلەدا هەيە. |
| حامض البروبيونيك | Propionic-acid | (ترش پرۆپيۆنيك)، ترشێكی چەوری تاك تفتيە، بريتيە لە شلەيەكی بێ ڕەنگ لە پلەی (١٤١)ی سەدييدا دەكوڵێت. |
| حامض الموريك | Moric-acid, Muric-acid | (ترش مۆريك)، ترشێكە لە تووە سپييكە دەردەهێنرێت. |
| حامض شاهترجي | Fumaric-acid | (ترش فيوماريك)، لە شاتەرە دەردەهێنرێت. |
| حامض الكافئيك | Coffeic acid | (ترش كافيئيك)، بەشێوەی كريستاڵی زەرد قاوە دەردەهێنرێت. |
| حامض الكلوريك | Chloric-acid | (ترش كلۆريك)، ترشێكی يەك (تاكە) تفتە خوێی كلۆرەيت پێك دەهێنێت. |
| حامض الكلوكونيك | Gluconic-acid | (ترش گلۆكۆنيك)، لە ئەنجامی ئۆكساندنی شەكری كلوكۆزەوە پەيدا دەبێت. |
| حامض، دي . ان . اي | Deoxy-ribonucleic-acid, D.N.A | (ديوكسی-رايبوز نيوكليك ئەسيد)، (دی، ئێن ، ئەی)، ئەو ترشەيە كە لە لايەن پرۆتينی ناوكی خانەزيندەوەرەكانەوە هەڵگيراوەو دەستێكيی بالای هەيە لە گواستنەوەی سيفەتی زگماكی لە نەوەيەكەوە بۆ نەوەيەكی تر لە زيندەوەرەكاندا. |
| حامض شحمي، حامض دهني | Fatty-acid | (فاتی ئەسيد)، ترشی چەوری، ئەو ترشە ئۆرگانيكيانەيە كە ئەگەر لەگەڵ گليسرين يەكيان گرت ئەستەر پەيدا دەكەن. |
| حامض رايبونيوكليك، حامض (ار،اين، اي) | Ribonucleic-acid R.N.A | (رايبۆنيوكليك ئەسيد)، (ئار، ئێن، ئەی)، پرۆتينێكی ناوكييە، لە سايتۆپلازمی خانەدا هەيە، پەيوەندييەكی تەواوی هەيە بە پێكهاتنی پرۆتينەوە. |
| حامض السكسنيك | Succinic acid | (ترش سەكسينيك)، ترشێكی جووت تفتيە لە شيلەی قاميشی شەكرو لە درەختی گەرچەك و ماسولكەدا هەيە. |
| حامض البوتريك، حامض الزبديك | Butyric-acid | (بوتەريك ئەسيد)، ترش كەرە، ترشێكی بێ ڕەنگە لە كەرەدا هەيە، لە دروست كردنی مادەی پاكژكەرەوەو عەترو دەرمان و بۆيەدا بەكاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| حامض السيناميك، حامض القرفة | Cinnamic-acid | (ترش سيناميك)، بەشێوەی کریستاڵی دەرزیلەیی لەدارچیندا هەیە. |
| حامض الأسيتيل، ساليسيليك، اسپرين | Acetyl-salicylic-acid | (ترش ئەسیتیل، سالیسیلیك)، ئەسپرین ، مادەیەکی سپییە بە شێوەی دەرمان دژیی سەرئێشەو رۆماتیزمە هەروەها بۆ هێنانە خوارەوەی تا بەکاردێت. |
| حامض الزرنيخوز | Arsenious-acid | (ترشی ئارسینیۆز)، یەکێکە لە ترشەکانی زەرنیق ( ئارسین). |
| حامض الزرنيخيك | Arsenic- acid | (ترشی ئارسینیك)، لە ئەنجامی تواندنەوەی ئارسنیك پینتۆکساید، واتا پێنجەم ئۆکسیدی زەرنیق)، لە ئاودا پەیدا دەبێت. |
| حامض الكابريك | Capric- acid | (ترشی کاپریك)، لەدروست کردنی رێسێن و عەترو مادەی بۆن خۆشکەردا بەکاردێت، لە خوری و شیری ئاژەڵ و گوێزی هیندو رۆنی خورمادا هەیە. |
| حامض نووي،حامض النيوكليك | Nucleic-acid | (ترش نیوکلیك)، ترشێکە لە پێکهاتنی کرۆمۆسۆمی ناوکی خانەی گیاندارداهەیە،دوو جۆری هەیە ترشی ریبۆزنیوکلیك، وە ترشی دی ئۆکسی ریبۆزمیوکلیك، لەچەند بەشێك پێکهاتووە وەکوو ترشی فوسفۆرو شەکرو پرۆتین، بە هاوبەشی لەگەڵ پرۆتینداکار دەکەنە سەر گەورەبوونی خانە. |
| حامض الفوليك | Folic-acid Vitamin- B2-Complex | (ترشی فۆلیك)، مادەیەکی ترشە لە لەشی باکتریادا پەیدا دەبێت یارمەتی دەدات بۆ جێ بەجێکردنی چالاکی زیندەوەری، لە جگەرو شیرو هێلکەو هەندێك سەوزەواتدا هەیە، بۆ خوێن کەمی بەکاردێت. |
| حامض الفثاليك | Phthalic-acid | ترشی فسالیك، بە شێوە پوازکی یان پولەکەی بێ رەنگ لە ئەنجامی ئۆکساندنی نەفتالین پەیدادەبێت. |
| حامض الكلوروذهبيك | Chloroauric-acid | (ترشی کلۆرۆئۆریك)، ترشی کلۆرۆزێریك ترشێکی ئاڵۆزە، لە ئەنجامی تواندنەوەی ئۆریك ئۆکساید لە ترش هایدرۆکلۆریکدا پەیدا دەبێت. |
| حامض شقاري | Anemonic-acid | (ترش ئەنیمۆنیك)، ترشێکە لە گوڵاڵە سوورە دەردەهێنرێت. |
| حامض هليوني، حامض الأسبارتيك | Aspartic-acid | (ترش ئەسپارتیك) ترشێکە لە کولەکەو فاسولیاو لۆبیا دەردەهێنرێت. |
| حامل، حاملة، حبلي | Pregnant | سکپڕ، ئاڤس، زك پڕ، ئاوس،بەزك، بە تێست، دوو گیان. |
| حامل الزهرة | Receptacle | گوڵ هەڵگر، لاسکلی گوڵ. |
| حامل العدوى، حامل الجراثيم | Carrier of germ | میکرۆب هەڵگر، هەڵگری میکرۆب،ئەو کەسەی کە میکرۆبی هەڵگرتووە گەرچی نیشانەی نەخۆشی تیادا دیار نیە. |
| حامل ثلاثي، حامل ثلاثي للبندقية | Tripod | سێپا، سێ قوله، چەتاڵ. |
| حامل (للأجهزة) | Stand | هەڵگر، راگر، هەڵگری داموو دەزگا. |
| حامل رأس الغول، فرساوس، كوكبة الجبار | Perseus | ( پێرسیوس) هەڵگری سەری دێو، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| حامل اللون، حبة لونية | Chromatophore | رەنگ هەڵگر، دەنکی رەنگ، هەڵگری رەنگ، توورەکەیەکی بچووکە رەنگی تیادایە، لە پێستی هەندێك گیانداردا هەیە، وەکوو لە گیانداری خۆر پەرست (حرباء) دا. |
| حامل الكريات | Ball-bearing | بۆڵ بەرین، ئامرازێکە لە ئۆتۆمبێلدا هەیە. |
| حامل النوتة الموسيقية | Music-stand | سێپای نۆتەی مۆسیقی. |
| حامل السمة | Style | نێرکی گوڵ، قەڵەمی گوڵ. |
| حامل الطائرات | Aircraft-Carrier | فرۆکە هەڵگر، پاپۆڕێکی زۆر گەورەیە فرۆکە لە شوێنێکەوە دەگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر. |

| | | |
|---|---|---|
| حاملة | Vehicle | (ڤیکل)، هەر ئاوێتەیەك کە تێکەڵاوێك بتوێنێتەوە وەکوو مەرەکەب، یان هەر مادەیەکی شلە ئەگەر لەگەڵ رەنگێك تێکەڵ بکرێت بۆیەی لێ دروست ببێت. |
| حامت | Sugared, Sugary | شیرین، شەکرین، شەکراوی، هەموو میوەکی شیرین وەکوو خورماو ترێ. |
| حامول، جعفیل، هالوك، اسد العدس | Dodder, Broom- rape, Orobanche | گیاکەڵە، گورگە، روەکێکی مشەخۆرە مادەی کلۆڵۆفیلی نیە، لەسەر روەکی تر دەژی، قەدەکەی وەك دەزوولەیەکی سوور یان زەرد وایە، دەئاڵێتە قەدی رووەکی تری وەك لۆکەو میوەی ترش و خواردەمەنی لێ هەڵدەمژێت و زیانی پێ دەگەیەنێت. |
| حامول الماء، بشت القرد | Horn- Weed, Bladder-Wort | (ئەتریکولاریا)، گیا میزڵانە، گیاکەڵەی ئاوی رووەکێکە توورەکەی پێوەیە بۆ گرتنی مێش و مەگەز، قەدو گەڵاکەی سەر ئاو دەکەوێت. |
| حامول البحر، زرام | Halophila | (هالۆفیلا)، سوێرەجێ، شۆرەجێ، روەکێکە لە ئاوی سوێردا دەڕوێت. |
| حامكة | Entomophagous | (ئینتۆمۆفاگەس)، مێروویەکی دڕندەیە. |
| حامز | Pungent | توون، تیژ، سوتێنەر. |
| حامي | Protector | پارێزەر، پارێزگار. |
| حامية | Garrison | لەشکر. |
| حانة، حان، خمارة | Bar, Wine-Shop | مەیخانە. |
| حانوت | Shop | دوکان، موغازە، کۆگا. |
| حانوط ، اس | Myrtle | درەختی مۆرد. |
| حانوش، حايوت، اكل الحيات | Ophiophagous | مارخۆر، گیانداری مارخۆر. |
| حاوي | Charmer, Magician | سیحرباز، جادوگر. |
| حاوي الحيات | SnaKe-Charmer | مارباز، مارگر، ئەوەی مار پەروەردە دەکات و یاریان پێ دەکات. |
| حباب | Male-ChucKor | نێرەکەو، بەق. |
| حباب، حباب الماء | Bubble, Air-cell | بڵقی ئاو، بڵقی سەر ئاو، بەقبەقۆك، پەقویشك. |
| حبابة، حباب | | مێروویەکی رەشی ئاوییە. |
| حبابة | Ampule | (ئەمپوول)، قاپێکی شووشەی بچووکی پاکژە، دەرمانی تیا هەڵدەگیرێت. |
| حبال صوتية | | ژێیەکانی دەنگ، چوار لۆچە، واتا چوار ژێیە لە قوڕگدا لە ریشاڵی سپی پێك هاتوون کە هەوایان بە نێواندا تێپەڕ دەبێت، دەنگ پەیدا دەکەن. |
| حبال | Roper | پەت دروست کەر. |
| حبالة، احبولة، شرك | Net | تۆڕ، داو، تەڵە، تەپکە، داف. |
| حباحب، يراعة قطرب | Glow-worm, firefly | گوڵە ئەستێرە، شەوچراخ، بسبسۆك، جۆرەمێروویەکی (قاڵۆنچە) رەنگاو رەنگە بەشەو دەفڕێت، لە شانەکانی لەشیدا مادەیەکی تیا دایە پێی دەوترێت(لۆسیفرین) کە هەناسە وەردەگرێت ئەو مادەیە دەسووتێت(بەبێ گەرمی) وە روناکی دەداتەوە. |
| حباب، لينارية | Toad-flax | کەتانی بۆق، جۆرە روەکێکە. |
| حباحب | Luciola | (لوسیۆلا)، ماسیەکی رووبارییە سەرەکەی درێژو باریکە. |
| حباج، شبحر العنب | Grape-vine | دارمێو. |
| حبار، حبار السبيط، سبيدج، صبيدج، أم الحبر، سيبيا | Cuttle-fish, Squid, sepia, InK-fish | (سکوید)، (سیپیا)، مەرەکەب وەشێن، جۆرە گیاندارێکی دەریایی نەرم و لینجەو دەخورێت، شێوەیەکی هێلکەیی هەیە سەری لە خوارەوەو قاچەکانی لە سەرەوەیە قەپاغێکی رەقی هەیەو شلەیەکی رەش دەردەدات لە مەرەکەب دەچێت لە کاتی مەترسیدا، بۆ رەنگ کردن بەکار دەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| حباجر، حبرج | He-bustard | نێرەچێرگ. |
| حباط، طبل | Wiffed, flatulence | باکردن، باکردنی ئاژەڵ، بەهۆی زۆرخواردنی گژوگیا. |
| حباك، نساج، تنوط | Weaver-bird | قوشقە، گورەویلە،قولتە، باڵندەیەکی بچووکە لە چیلکە هێلانەکەی دەچنێت. |
| حباك | Binding, Knitting | شیرازە، شیرازی. |
| حباك، وشیع | Palisade, paling | پەرژین یان تەیمان. |
| حباسة | Tontine | ئەو گوێنی گڵ و خۆڵەیە کە دەکرێن بەرژێر ئەمامەوە لە کاتی گواستنەوەدا. |
| حباري متوجة، حبرج، خرب | Houbara-bustard | چێرگی کلاودار، رەنگەکەی سپی یان خۆڵەمێشییە. |
| حباري،حبراية، حبرور، صو | Bustard | چێرگ، پەت، مێشەسی، چرگ، مریشکە کێوی، باڵندەیەکی گەورەیە لە قەلەموون دەچێت و بە قەدەر قەلەمونێکیش دەبێت گێژو وێژەو لە دەشت و دەرا دەژی زۆرجار هێلانەکەی خۆی لێ تێک دەچێت، سەری گەورەو ملی درێژو ئەستورە دەنووک و قاچی قاوەیی مەیلەو زەردن، پەرەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە، میلی رەشیی تێدایە، وە بەشێوەی پۆل بچووک دەژین. |
| حب الملوك، جتروفة، دند الملوك | Spurge-netle-jatropha | (جاتروفا)، دەوەنێکە شیراو لە قەدو گەڵاکەی و دەرمان لە تۆوەکەی دەردەهێنرێت. |
| حب الملك، كرز | Cherry | گێلاس، ئاڵوباڵو. |
| حب الشباب، حب الصبا | Acne | ئەزبە، عازەبە، زیبیکە، جوانە. |
| حب استوائي، حبة بغداد،اخت بثرة شرقية | Baghdad-boil, leishmania-tropica, oriental-Sore , oriental boil | کانی خورما، دوملی خۆرهەلات، دوملێکی کێم دارە لەسەر پێستدا پەیدا دەبێت کە چاك دەبێتەوە شوێنەکەی دەمێنێتەوە ، بەهۆی مێشێکی خوێن مژەوە بلاو دەبێتەوە. |
| حب الغمام، برد | Hail | تەرزە، تەزرە، تەرك. |
| حب غول، حبة خضرة، بطم | Terebinth | قەزوان، بنێشتیشی لێدەردەهێنرێت. |
| حب، دن، زير الماء | Large water-jar | مەرکانە، کوپەی ئاو. |
| حب بثرة | Pimple, pustule, sore, boil | پیزۆکە، زیپکە. |
| حب الظهور | Ostentation | خۆنواندن، حەز لە خۆدەرخستن. |
| حب السيطرة | Will of control | حەز بە داگیرکردن. |
| حب الأستطلاع | Curiosity | حەزکردن بەفێربوون، حەز بەشت زانین کردن، فێربوون یا زانین حەزی سووسەکردن، سووسەکردن. |
| حب القلب، شنجبار، مخزني | Common-gromwell, pearl-plant | (گرمویل)، دەنکی دڵ، تۆوی دڵ، گیایەکە گوڵەکەی پەمبەییە تۆوەکەی لە مرواری دەچێت بۆ مەبەستی پزیشکی و بۆ میزپێکردن باشە. |
| حب بلاذر، حب كابلي، حب انقرديا | Anacardium-occidentale | بەری ئەناکاردیەم، بەری درەختێکی ناوچە گەرمەکانە لە کۆمەڵەی عەمبە، شیراوێکی سپی لێ دەردەهێنرێت بۆ قەڵاچۆکردنی مێروو، بەرەکەی چەورو شیرینە رۆنی لێ دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی نەخۆشی گوڵی. |
| حب السنبل، خطمي هندي | Lantern-flower | هێرۆی هیندی، گیایەکە بەرزە گوڵەکەی زەردە ریشاڵەکەی بۆ دروستکردنی گوش بەکاردێت. |
| حب العصافير، بشتة فلاريس | Phalaris, canary-grass | گیا کەناری، دەنکی چۆلەکە، گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵودان بۆ لەوەر باشە، دەنکەکەی دەدرێت بە چۆلەکە. |

| | | |
|---|---|---|
| حب | Love | خۆشەویستی، ئەڤینی، حەزکردن، دڵداری. |
| حب الذات | Selfishness, egoism | خۆپەرستی، خۆ ویستن، خۆخۆشویستن. |
| حب عذري، حب افلاطوني | Platonic love, Friendship | خۆشەویستیی پاك، دڵدارییەکی پاك. |
| حب الرمال، حبهان،هال، هيل، هيلبوا، قاقلة، شوشمة، حب الجنة، شوشمير | Cardamom, Grain-of paradise amome amomum | هێل، حێل رووەکێکی پزیشکی بۆن خۆشە قەدی ژێر زەوی هەیە لە ناوچە گەرمەکاندا دەڕوێت، گوڵەکەی وەکوو چەتر وایە بەرەکەی بەشێوەی کەلوە، دەنکەکەی بۆن خۆشە دەکرێتە خواردەمەنییەوە وەکوو چای‌و قاوەو مەی هەروەها دەرمانی لێ دەردەهێنرێت. |
| حب الهلال، قمرية، سم السمك | Moon-Seed | دەنکی مانگ، ژەهرەماسی، رووەکێکی کەپریە گوڵەکەی بچووکە بەرەکەی مادەی سڕکەری تیادایە بۆ راوەماسی بەکاردێت. |
| حب السلاطين، حب الخطايا، حب الملوك | Croton-Oil-plant, croton-samina | ماهودانە، دەند، جۆرە درەختێکە بەرەکەی بۆ رەوانردن بەکار دەهێنرێت. |
| حب النيل، اثمان النيل، جلاب النيل | Nile-ipomoea, Blue-morning-glory | لاولاوی نیل، گیایەکی خۆهەڵواسەرە گوڵی شینی گەورە دەگرێت، مالوێنچەی نیل، مالوێنچەی بەیانی. |
| حب العروس، فلفل كبابة | Cubeb-pepper | کەبابە، رووەکێکە وەك بیبەر وایە بەرەکەی بریتییە لە بەهارات. |
| حب الفريز، حبالزلم، زلم، سعد ماكول | Earth-almond, Edible-cyperus | قوڕاوە، قوریجان، سمڵ، جۆرە رووەکێکە گەڵاکانی درێژن، قەدەکەی دەنکی قوپاوی رەشی چەوری پێوەیە دەخورێت. |
| حب الياس | Myrtle-berry | دەنکی مۆرد، بەردی مۆرد. |
| حب العرعر، ابهل | Juniper-seed | بەری هەڤرێسك، دەنکی هەڤرێسك، رۆنێکی لێ دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی نەخۆشی وڵاخ. |
| حب اللقد،، ارثد، سرساد، بنجنكشت، شجرة ابراهيم، كف مريم | Agnus-castus, Hemp-tree, Abrahms-balm | درەختی گوش، درەختی ئیبراهیم، لەپی مریەم، تۆوی نەزۆکی، دەنکی وەجاخ، کوێری، سەرساد، دەوەنێکی پزیشکییە گوڵەکەی جوان‌و بۆنخۆش‌و شینە، بەرەکەی لە دەنکی بیبەر دەچێت، گۆایا بەکارهێنانی دەبێتە هۆی نەهێشتنی ئارەزووی رەگەزی‌و وەجاخ کوێری. |
| حب السفرجل | Quince-Seed | دەنکی بەهێ، بێ دانە، خەجووجك، هەنجووجك. |
| حب الرشاد، حبر الحرف | Garden-cress, water-cress | دەنکی تەڕەتێزە. |
| حب لمسك، عنبربول، خطمي مسكي | AbelmosK, MusK-oKra, MusK-Mallow | دەنکی مسك، هێرۆی مسك، رووەکێکە گوڵی زەرد دەگرێت، بەرەکەی لە بەری فاسۆلیا دەچێت، دەنکەکەی خڕو بۆنخۆشە بۆ دروستکردنی عەتر بەکاردێت. |
| حبة، عجم العنب | Grape-Stone | تۆوی ترێ، دەنکی ترێ. |
| حبة، حلوة، انيسون، كمون حلو، يانسون | Anise, Sweet-cumin | رازیانە، زیرەی شیرین، گیایەکە گوڵەکەی وەکوو چەتر وایە سپیە بەرەکەی وردو سەوزو بۆن خۆشە، رۆنێکی بۆنخۆشی لێدەگیرێت دەکرێتە عەرەقەوە. |
| حبة، حب، بزر | Seed, Grain, Kernel | دەنك، دانەوێڵە، دان، دەندك، بەری دەغڵودان، وەکوو گەنم‌و جۆ. |
| حبة، قمحة | Grain | بچووکترین یەکەی کێشانە دەکاتە ٠٦٤٨ر٠ گرام -١/٤کارات، (قیراط). |
| حبة اللقاح، حبة الطلع | Pollen-grain | تۆزی هەڵاڵە،هەڵاڵە، تۆوی نێرەکی، دەنکی هەڵالە. |
| حبة مركزية | Centriole, Centrosome | (سێنتریۆل)، (سێنترۆسۆم)، دەنکی ناوەندی، بەشێکە لە تەنی ناوەندی واتا(سێنترۆسۆم)یسایتوپلازمی خانە. |

| | | |
|---|---|---|
| حبو نشوية | Amyloplast | (ئەميلوپلاست)، دەنكی نيشاستە كە لە خانەی رووەكدا هەيە. |
| حبة، عجمة | Kernel | دەنك، تۆو، تۆڤ، ناوك، وەكوو ناوكە قەيسی. |
| حبة خضراء، حبة خضرة، ضراوة بطم، قريقشة | Terebinth-tree | قـەزوان، قـەزوانی شـين، قەسـقەوان، وەن، وەنەمشـك، دارەبـەن، بێمـك، بنوشووكە، كەزوان، شينۆك، درەختێكـە بەرمكـەی خـڕو بچـووك رەقـە لـە قەدەكەی مادەيەكی رێسينی بۆنخۆشی واتـا (بنێشـت) دەردەهێنرێت بـۆ مەبەستی پيشەسازیو پزيشكی. |
| حبة، بذرة | Seed | تۆو، دەنك. |
| حبة دوائية | Pill | حەب، حەبی، دەرمان، دەنك. |
| حبة العين، انسان العين | Pupil | بيبيلە، بيلبيلەی چاو. |
| حبة نباتية، غير ناضجة | Unripe seed | پەنيرە، تۆوێكی (بەرێكی) رووەكی پێنەگەيشتوو. |
| حبة لونية، حامل اللون | Chromatophore | (كرۆمـاتۆفۆر)، دەنكـی رەنـگ، توورەكەيـەكی بچووكـە رەنگـی تێدايـە لـە پێستی هەندێك گياندارەدا هەيە وەكوو گيانداری خۆرپەرست (حرباء). |
| حبة البركة، حبة السوداء، شونيز | Black-cumin, fennel-flower, Nigella-seed | رەشـكە، زيـرەی رەش، سـياوڵە، قـاخلی، كاژيلـە، دەنكێكـی وردی رەشـی بۆنخۆشە دەكرێتە نانەوە. |
| حبة القلب | Heart-pea | قەزوانی رەش، دەنكی دڵ، رووەكێكە گوڵەكەی سپی‌یە دەنكەكەی بە قەدەر نۆكێك دەبێت، رەش‌و رەقە ملوانكەی لـێ دروست دەكرێت. |
| حبة الراعي، بطاط، عصا الراعي، جنجر | Knot weed, Knot wort, Crawl-grass, Knot-grass, poly-gonum | دەنكە شوانە، دارە شـوانە، گيـا گـرێ، گيايـەكی خشـۆكی تەمـەن درێـژە، گوڵەكەی بێ كاسەيە سپی يان پەمبەييە. |
| حبتر | Epomophorus | (ئيپۆمۆفۆر)، جۆرێكە لە شەمشەمەكوێرە. |
| حبث | Tailless Viper | كوڵەمار، مارێكی كوڵی ژەهرينە. |
| حبحب | Melon | زەبەش، جەبەش، كاڵەك، گندۆر. |
| حبحب، باوباب | Baobab, MonKey-bread, Adansonia | (باوبـاب)، (ئەدانسـونيا)، نانەمـەيمون، درەختێكـی گەورەيـە بەرمكـەی بەقەدەر پرتەقاڵێك دەبێت ترش‌و تفتە. |
| حبجب، حب حب | Water-melon | شووتی، شفتی. |
| حبر، مداد | InK | مەرەكەب. |
| حبر ازرق | Blue inK | مەرەكەبی شين. |
| حبر المطابع | Printing inK | مەرەكەبی چاپخانە. |
| حبر ثابت | Fixed inK | مەرەكەبی جێگير، مەرەكەبی نەگۆڕ، بريتی‌يە لە گيراوەی نەوشادرو خوێنی زيبو. |
| حبر سري | Sympathetic-inK | مەرەكەبی نهێنيی، مەرەكـەبی ناديـار،جـۆرە مەرەكەبێكـە بـە گـەرمكردن‌و مادەی كيميايی نەبێت دەرناكەوێت. |
| حبر صيني، حبر هندي | China-inK, Indian ink | مەرەكەبی چينيی، مەرەكەبی هينديی. |
| حبر احمر | Red InK | مەرەكەبی سوور، مالينوس، سورخ، دەرمانێكە بۆ چارئێشە. |
| حبر بر، حبر قش | Young-Camel | بەچكە، وشتر. |
| حبرة | Joint | گرێی قەدی درەخت. |
| حبرج، صبرم، خرب | | راجع(حباری متوجه). |
| حبرور | Little-bustard | چێرگی بچووك، بەچكە چێرك. |
| حبس | Imprison | بەند كردن، گرتن. |

| | | |
|---|---|---|
| حبسة | | حەپەسان، بارێکی دەماریی و دەروونییە ئەو کەسە لە هیچ ناگات، و ناتوانێت هەستی خۆی بدرکێنێ. |
| حبشقة، حبشوقة | Danlulus | (دانیولەس)، جۆرەمێرووییەکە لە هەزار پێ دەچێت. |
| حبشي، ديك، ديك رومي | TurKey-cocK | قەلەموون، عەلی شیش، باڵندەیەکی گەورەیە لە کۆمەڵەی ملایشك ملی بێ پەڕە نێرەکەی چەپکێك تووکی گەورەی بە سینگەوەیە کلکی وەکوو تاوس بلاو دەکاتەوە. |
| حبض، علاك | Cheese-weed | گیاپەنیرە، دەوەنێکە گوڵەکەی بۆنخۆشە. |
| حبق، حبق، هندي، حوك، بادروج | Veronica, Basil, sweet- basil | ریحانە، رەیحانە، ژیون، ئەسپەرم، گیایەکی هاوینەی بۆنخۆشە، بۆ دروست کردنی مەی بەکاردێت، گوڵەکەی سپی یان پەمبەیی و بۆنخۆشە. |
| حبق البقر، بابونج | Camomile | بەیبوون، گیایەکی بۆنداری، دەشتەکییە گوڵەکەی زەردو سپییە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| حبق، بري | Wild-basil | رەیحانە کێویلە، گەڵاکەی توکنە گوڵەکەی پەمبەییە. |
| حبق الراعي، شويلاء | Mug-wort | (سانتۆلیا)، رەیحانە کێویلە، رەیحانە شوانە، گیایەکی بۆنخۆشە دەکرێتە مەیەوە. |
| حبق الماء، نعنع الماء، حبق التمساح | Water-mint, marsh-mint | نەعنا، پونگە، گیایەکی پزیشکیی بۆنخۆشە. |
| حبق سعتري | Sweet-basil, small-basil | شاریحانە، ئەو ریحانەیە کە لە ماڵان دەڕوێنرێت. |
| حبق الشيوخ، حبق مرو | Amaracus | رەیحانە شێخانە. |
| حبق الرهبان، ريحان سليَمان | Holy-basil, Monk's basil | رەیحانەی پیرۆز، رەیحانەی سلێمان، جۆرێکە لە رەیحانە ئاوك و تۆوەکەی دەرمانیان لێ دروست دەکرێت. |
| حبق ترنجاني، ترنجان | Lemon-balm | ترنج، گیایەکە گوڵەکەی سپیی و مەیلەو پەمبەییە، گەڵاو گوڵەکەی بۆنخۆشە دەکرێتە چایی و دەرمانی لێ دەردەهێنرێت. |
| حبق الفيل، مرزنجوش، مردكوش | Sweet-marjoram | مردەگوش، مەرزەنگوش، گیایەکی دەشتەکیی بۆنخۆشە گوڵەکەی بە شێوەی هێشوە، عەتر لە گوڵ و گەڵاکەی دەردەهێنرێت. |
| حبق بر فرنجمشك، حماحم،حبق قرنفلي | Soft-haired-basil, Basil-thyme | رەیحانەی تووك نەرم، ریحانەی مێخەکیی، رەیحانەیەکە گوڵەکەی پەمبەییە. |
| حبقبق، زر الورد | Indian-sphaeranthus | گیایەکی کشتوکاڵییە بۆ رازاندنەوە. گوڵەکەی سوورو بۆنخۆشە. |
| حبكة، تكة، حبل السروال | Running band | بەنەخوێن، دەمەرقۆپان، پەتی دەرپێ، دۆخین، پزووی دەرپێ، یان شەرواڵ. |
| حبل ظهري | Notochord | پەتی پشت، پەتکی پشت، دەماری پشت دەمارێکی نەرمە لە ناوەوەی لەشی گیاندارە پەتدارەکاندا. |
| حبل | Rope, Cord, Chord | رشتە، پەت، گوریس، قەیتان، تەناف، رێسمان، وەریس. |
| حبل عصبي | Nerve-cord | پەتی دەماری. |
| حبل شوكي، نخاع شوكي | Spinal-cord | دەماری دڕکاویی، پەتی دڕکاویی، مەغزی دڕکاویی. |
| حبل سري | Umbilical-cord, funicle, navel-string, funis, funiculus | بۆڕی ناوك، پەتی ناوك، پەتێکە خواردەمەنی لە وێڵداشەوە دەدات بە لەشی پس(بێچو) لە مناڵداندا. |
| حبل الصوت | Vocal-cord, phonochordia | داوی دەنگ، ژێی دەنگ، لە دەوروپشتی قوڕگداهەیە. |
| حبل مسكي | Evergreen-Clematis | یاسەمەنە کێویلە. |

| | | |
|---|---|---|
| حبل غليظ، قلس | Cable, Hawser | پەتی ئەستوور، گوريیس، هەفسار. |
| حبل الغسيل | Clothes-line | تەناف، رست، پەتی جلی شۆراو. |
| حبل، حمل | Pregnancy, Gestation | ئاوسيی، سك پڕبوون، ئاوس بوون، ئاڤس بوون. |
| حبل كاذب حمل كاذب | False-pregancy | شەيتان ئاوس، ئاوس درۆزنە، سك پڕی درۆزنە. |
| حبل منوي | Spermatic-cord | گونەوينڵە، بۆڕی شاوەت، بۆڕيی سپێرم، ئەو بۆڕيیەی کە ئاوی نێر(سپێرم) دەگوێزێتەوە لە کۆئەندامی زاوزێدا. |
| حبليات ، حبلي لافقري | Chordata | (کۆرداتا)، پەتدارەکان، کۆمەڵە گياندارێکن بڕبڕەی پشتيان نيە، بەڵام مەغزی دڕکاوييان هەيە، وەکوو لامپريی و ماسيی کڕکڕاکەدار. |
| حبل المساكين، لبلاب | Bent wood, Ivy | لاولاو، جۆرە گيايەکی خۆهەڵواسەرە گوڵەکەی لە ڕەحەتی دەچێت بە ڕەنگی هەمەجۆرە. |
| حبل النسيج، سداة | Warp | تان، ئەو دەزووەی کە بەباری درێژيدا رايەڵ دەکرێت لە کاتی چنين( جولايی)دا. |
| حبلي، حبلانة، حامل، حاملة | Pregnant | ئاوس، ئاڤس، سکپڕ، دوو گيان، باردار. |
| حبلاس، أس | Myrtle | مۆرد، مۆرت، ڕووەکێکی بۆنخۆشە. |
| حبلة، سنفة، قرنة | Pod | کەلوو، قاپڵوخ،بەری هەندێك ڕووەکی وەکوو پاقلەو فاسۆليا کە دەنکەکانی تيادايە. |
| حبلاب، ستومانيا | Syrian blind weed | گيا کوێرە جۆرە گيايەکە. |
| حبلق | | مەڕو بزنی بچوك‌و گرگن. |
| حبليل، خرطون، دودة الأرض | Earth-worm | کرمی زەويی، کرمێکی سووری درێژی باريکە لە زەويدا هەيە، زەوييەکە شی دەکاتەوە. |
| حبن | MonKey | مەيموون. |
| حبن،حبن، حبين | Rose, bay-oleander | ژاڵە، کەرکوژە. |
| حبن، استسقاء | Dropsy | ئاوبەنگ، کۆبوونەوەی شلاو لە شانەو ئەندامەکانی لەشدا کە دەبێتە هۆی ئاوسان وەکوو لە مێشك‌و گون‌و جومگەو ناو سکدا. |
| حبهان، | | (راجع حب الهال). |
| حبوب | Cereals, Corns Crops | دەغڵودان، دانەوێڵە، خەلە، خەلەو خەرمان، وەکوو گەنم‌و جۆ و برنج‌و گەنمەشامی. |
| حبوب اللقاح | Pollen-grains | هەڵاڵە، دەنکی هەڵاڵە تۆوی نێرەکی، تۆوی هەڵاڵە. |
| حبوة، حمل | Load | کۆڵ، بار. |
| حبوة، حبو، زحف علی اليدين | Crawling | گاگۆلکێ، گاوڵەکێ، قنگەخشکێ. |
| حبوة، حشيش السكران، كاكنج، كرز القدس | Goose-berry, Winter-Cherry | گێلاسی زستانە، گيای سەرخۆش، تووی قاز، گيايەکە لە کۆمەڵەی باينجان گوڵی زەرد يان سپی يان وەنەوشەيی دەگرێت، بەرەکەی پرتەقاڵی يان بنەوشەيی‌يە، ترش‌و تفتە دەخورێت. |
| حبوش، اشرف | Nesonycteris | جۆرێکە لە شەمشەمەکوێرە. |
| حبيبة | Granule | کلۆ، دەنکۆڵە، دەنکۆکە. |
| حبيبة صبغية | Pigment-granule | دەنکۆکەی ڕەنگ. |
| حبيش، غرغر،دجاج، حبشي، دجاج فرعون | Guinea-fowl | مريشکی حەبەشە، چين‌و ماچين. |
| حبيبي | Granular | دەنکدار، گرنج گرنج. |

| | | |
|---|---|---|
| حبيبة نسل | Nissles-granules | دەنكۆڵەی نیسیل، دەنكۆڵەیەكە خواردەمەنی تیا كۆكراوەتەوە لەناو خانە دەمارییەكاندا. |
| حبينة، حردون، ام حبين، عضرفوط، قاضي الجبل | Agama, judge of the desert | قۆڕپی، جۆرێكی گەورەیە لە مارمێلكە. |
| حبيبات فتيلية، سبحيات | Mitochondria | (میتا كۆندریا)، بریتییە لە چەند تەنێكی ورد لە سایتۆپلازمی خانەدا بەشێوەی دەنكۆڵەیە. |
| حت، انحتات | Erosion | راماڵین، داخوران، وردبوونو راماڵنی گڵ بە كاری باو باران. |
| حتار، حاشية | Margin, frame | قەراغ، كەنار، چوارچێوە. |
| حتت | CanKer | (كانكەر)، خورە، نەخۆشییەكە تووشی درەخت دەبێت. |
| حتة، حترة | Bit, small-piece | پارچە. |
| حترة | SucK | مژ، فڕ، قوم. |
| حتف، موت | Death | مردن، مەرگ. |
| حتن، معامل | Coefficient | هاوكۆڵكە. |
| حث | Sand-stone | بەردی لم، لمی وشك. |
| حث | Induction | كارتێكردن، هاندان. |
| حث كهربائي | Electro-induction | هاندانی كارەبایی، كارتێكردنی كارەبایی. |
| حث مغناطيسي | Magnetic-induction | كارتێكردنی موگناتیسی، هاندانی موگناتیسی. |
| حث ذاتي | Self-induction | هاندانی خۆیی، خۆهاندان. |
| حث كهر مغنيطي | Electro-magnetic-induction | هاندانی ئەلیكترۆ موگناتیس، پەیداكردنی هێزێكی پاڵنەری كارەبایی لە بازنەیەكی داخراودا، كاتێك كە گەیێنەرێكی كارەبایی لە بازنەكەدا دەجوڵێت و هێڵەكانی هێزی موگناتیسی دەبڕێت. |
| حثاة | Epicarp | (ئیپیكارپ)، توێكڵی دەرەوەی بەری رووەك. |
| حثالة، ثفل | Waste, Dregs, Sediment | زۆڵەك، خڵتە، تڵپە، بن بێژنگ، پەسمونە، سەركوزەرە، باریزە، دورد، گوشك. |
| حثالة الزيت، حثالة الدهن | Dregs of oil, Drege of wax | دەوێژ، دۆشندە، دۆوك. |
| حثالة الشمع، حثالة العسل، حثالة الصابون | Sediment of soap | كراژ، كراش، كرێشی مێو. بنیسكەی سابوون، نیمەشۆر، نیمەشێر. |
| حثالة الحنطة | Dregs of wheat | سەركوزەرەن كۆتەڵ. |
| حثر، تراخوما | Trachoma | تەراخۆما، وردێنە، هەوكردنی ژێر پێڵووی چاو. |
| حثرب | Turbid-water, muddy- water | ئاوی لێڵ، ئاوی لێخن. |
| حثواء | Dusty-land | خۆڵەپەتانیی، زەوییەك خۆڵی زۆر بێت. |
| حجام حجامة | Cupper Cupping | خوێن گر، خوێن گەر، خوێن بەردەر، خوێن گرتن، خوێن بەردان، چرتمیش، كەلەشاخ. |
| حجار، نحات، الحجر | Stone- cutter | بەردتاش، بەردبڕ، نەقار. |
| حجاب | Veil, Cover, curtain | رووپۆش،، بەچە، پەردە، پۆش، |
| حجاب حاجز | Diaphragm | ناوپەنجك، ماسولكەیەكی پانی تەنكی تەختە بۆشایی سنگ لە بۆشایی سك جیا دەكاتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| حجاب الة التصوير | Diaphragm | پەردەی کامێرا، خەپلەیەکە کونێکی تیادایە بڕی ئەو ڕووناکیە ڕێك دەخات کە دەچێت بۆ زەرەبینی کامێرا. |
| حجاج العين، حاجر، محجر العين | Orbit | چاڵی چاو، کاڵانەی چاو. |
| حجارة، رتاجة، علم الحجارة | Lithology | (لیـسۆلۆجی)، زانیاریی بەردەکان. |
| حجالة، مقلاع | Sling | قۆچەقانی، قەڵماسك، بەردەقانی. |
| حجبة | Hip-bone, Innominate-bone | ئێسقانی کلۆت، ئێسقانی سمت کە دەکەوێتە ژێر کەلەکەوە. |
| حجة، عذر | Plea, excuse | پەلپ، بیانوو. |
| حجة، برهان | Proof | بەڵگە، سەلماندن. |
| حجر | | گۆشتی دەوری نینۆك. |
| حجر، حجارة | Stone | بەرد، کۆچك،تب، خڕك. |
| حجر الأنابيب | Pipe stone | بەردی سەبیل، بەردێکی قوڕینی سوورە سەبیلی جگـەرەی لـێ دروسـت دەکرێت. |
| حجر الصدف | Coquina | (کۆکینا)، بەردە سەدەف، بەردێکی کلسی کون کونە بریتییە لە سەدەف (لەپکەی) گیاندارە نەرمەکانو شیلان. |
| حجر الصوان، حجر الفلنت، حجر القداح، حجر القدح | Flint | بەردە ئەستێ، بەرستە، بەراستە، بەردی چەخماخ، بەردی عازەبە، بەردێکی سەختو سپیو سافە. |
| حجر المسن، كوسرة | Grind-stone, whet stone | بەردەهەسان، بەردی هەسان، بەردەساو، هەسان، بەردی، تیژکردن، بەردی چێوەسات. |
| حجر البلاط، حجر لوحي | Flag-stone | تەلەبەرد، بەردی کێڵ. |
| حجر الفتيلة حرير صخري، اسبيست | Asbestos | (ئەسبێست)، کانزایەکی ریشاڵیە ناسوتێت کەلوپەلی لێ دروست دەکرێت. |
| حجر الزاوية | Corner-stone, quoin | بەردی بناغە، بەردی گۆشە. |
| حجرة فقاعات | Bubble-chamber | ژووری بلق، ژوورێکە، وێنەی تەنۆکەی ئەتۆمی (گەردیلەی) تیا دەگیرێت. |
| حجر الاساس، حجر السرء حجر الكلس | Foundation-stone-Lime-stone | بەردی بناغە،، بەردی بنچینە، بەردی قسل. |
| حجر كريم، حجر ثمين | Gem stone , precious-stone | بیجاد، بەردی بە نرخ، نقێم، نگێن، لال. |
| حجر الطحن، حجر الطاحونة | mill-stone | بەرداش، بەردەئاش، بەردی هاڕین. |
| حجر المغناطيس، حجر المغنيط | Lode- stone, Magnetic-iron stone | بەردی موگنـاتیس، گـەمن، ئاسـن ربـا، موکناتیسـیی سروشـتی، بـەردی ئاسن فڕێن، بریتیە لە ئاسنو ئۆکسجین. |
| حجر الشب | Alumstone, Alunite | بەردەزاخ، بەردی زاخ، کەرەسەیەکی خاوە بۆ زاخ ئەلەمنیۆمو پۆتاسیۆمی تیایە. |
| حجر كهرباء اسود، حجر اسود | Jasper | شەوە، بەردی شەوە. |
| حجر عريض | Flag stone | تەلەبەرد، سەل. |
| حجر رخو | Limp lax stone | شتران، بەردی فشەڵ. |
| حجر طيني(طفل) | Clay stone | بەردە قوڕ. |
| حجر اللازورد، لازوليت | Lazulite | بـەردی لاجیـوەرد، بـەردێکی شـینە، ئەلـەمنیۆمو مەگنیسـیۆمو ئاسـنو کالسیۆمو فوفسۆری تیادایە. |

| | | |
|---|---|---|
| حجر صفائحي | Slate | تەلەبەرد، تاوێر. |
| حجر جيري | Limestone, calcite | بەردی قسڵ، بەردی گەچ، بریتیە لە کالسیۆم کاربۆنەیت. |
| حجر الجهنم، حجر الكي | Lunar- Caustic, Silver-nitrate | بەردی جەهەنەم، نیتراتی زیو، بەردە دۆزەخ، جەهەنەم داشی، بەردێکی بریسکەداری مەیلەو خۆڵەمێشییە دەهێنرێت بە پێڵوی چاودا، بۆ چارەکردنی تەراخۆما بەکاردەهێنرێت. |
| حجر لبني، عين الشمس | Opal | (ئۆپاڵ)، بەردەشیری، بەردێکی بەنرخی رەنگینە رەنگەکەی شیرییە. |
| حجر الصين | China-Stone | بەردەچینیی، بەردێکی گرانیتیيە. |
| حجر الكوارتز، مرو | Quartz | دیژە، بەردێکە شووشەی لێ دروست دەکرێت. |
| حجر الشحذ | Whet stone | بەردی تیژکردن، بەردی هەسان. |
| حجر رملي | Sand-stone | بەردی لمی، تاوێر، تەمۆخ، بریتیە لە دەنکی کوارتز. |
| حجر الهدم، دبش | Rubble-stone | وردەبەرد، زیخ. |
| حجر القمر | Moon- stone | بەردەمانگ، جۆرێکە لە کانزای فلسبارو بەردێکی بە نرخە رەنگەکەی شینە شێوەی مرواریی هەیە بریتییە لە سلیکاتی ئەلەمنیۆمو پۆتاسیۆم. |
| حجر البازلت، شبيث | Basalt | (بازلت)، بەردەرەنەن، مەرمەری رەش. |
| حجر الطابعة | Lithographic-stone | بەردی چاپ کردن. |
| حجر الظفر، جزع، عقيق يماني | Onyx | (ئۆنیکس)، یاقیقی یەمەن، بەردێکی بە نرخە، بریتیە لە سلیکا بەشێوەی چینی رەنگاو رەنگ سپی، قاوەی، رەش خۆڵەمێشیی، سوور، هێڵی راستی تیادایە. |
| حجر الغرانيت | Granite | (گرانییت)، خارا، بەردە بیرۆ، بەردە ئەستێ. |
| حجر ناري، صخر ناري | Igneous-stone | گورئاسن، چەخماخ، بەردی چەقۆتیژکردن. |
| حجر النار | Pyrite | (پایریت)، بەردە ئاگر، بەردێکە لە ئاسنو گۆگرد رەنگەکەی زەردی مەیلەو قاوەییيە. |
| مركزيت | Marcasite | (مارکاسایت)، پایریتی ئاسنی سپی لە دروست کردنی بەردی بە نرخدا بەکاردێت. |
| حجر بركاني، طراب | Whin | بەردی گڕکانی. |
| حجر البلور، بلور صخري | RocK- crystal | بەردە بلووری، بریتییە لە کوارتزی رۆشن. |
| جر النقش، اردواز | Writing-Slaotet, Slate-tablet | بەردەنووس، تەلاشەبەرد، تەلەبەرد. |
| حجر الشطرنج، بيدق | Pawn, Man | بەردی شەترەنج، داشی شەترەنج. |
| حجر الداما، حجر الطاولة | Draught | داشی دامە. |
| حجر القدح | Flint, fire-flint | بەردە ئەستێ، بەراستە. |
| حجر الصابون | Soap stone | بەردە سابون، بەردێکی خۆڵەمێشی مەیلەو سەوزی نەرمە زوو ورد دەبێت دیمەنێکی سابوونی هەیە لە دروستکردنی دەزگای کارەباییدا بەکاردێت. |
| حجر الحديد، حجر جوي، رجم | Iron- stone-Meteorolite, falling-stone, aerolite | بەردی ئاسن، بریتییە لە کاربۆناتی ئاسن، بەردە ئەستێرە، ئەو بەردەی کە لە ئاسمانەوە دەکەوێتە خوارەوە لە ئەستێرەی کشاوەوە. |
| حجر القطر | Drip- stone, stalactite and stalagmite | (ستالاکتایتو ستالاکمایت)، بەردە دڵۆپە، بریتیە لە بەردی کالسیۆم کاربۆنەیت کە لە ئەنجامی دڵۆپانی ئاو پەیدا دەبێت لەناو ئەشکەوتەکاندا. |
| حجر المحك، حجر فحص المعادن | Touch-stone, assaying-stone, lydian-stone | سەنگی مەحەك، بەردێکی سلیکۆنیی رەشە زێڕو زیوی پێ تاقی دەکرێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| حجر الحية | Serpentine | بەردەمار، بەردێکی سەوزی پنکە پنکەیە رەنگەکەی لە کاژی مار دەچێت. |
| حجر التوتيا، حجر سليماني، كالامين | Calamine | (کالاماین)، بەردە توتیا، زینك سلیکەیتیی سروشتی، جۆرە بەردێکی کانزایە، بریتیە لە کەرەسەی خاوی زینك (توتیا). |
| حجر الدم، شادنج | Haematite, Blood stone | (هیماتیت)، بەردەخوێن،بەردێکی کانزایە ئاسنی تیایە رەنگەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە بریتییە لە ئۆکسیدی ئاسن. |
| حجر الدم المصري يشب مصري | Egyptian jasper | بەردەخوێنی میسری بۆ مەبەستی رازاندنەوە بەکاردێت. |
| حجريمان | Chalcedony | (کالسیدۆنی) جۆرێکە لە بەردی شەوەکە بەردێکی بە نرخی مەیلەو شینە. |
| حجر القرفة | Cinnamon-stone-Hessonite | بەردەدارچینی، جۆرێکە لە یاقیق رەنگەکەی سووری مەیلەو قاوەیی‌یە. |
| حجر الخفان، حجر الخفة، حجر النسقة، حجر الخفاف، نسفة خرفش | Pumice-stone | بەردەسووکە، بەردەبلق، بەردێکی بورکانی شووشەیی سووکەڵەی کون کونی سپییی یان خۆڵەمێشییە بۆ سافکردن بەکاردێت سەر ئاو دەکەوێت، لە کەناری دەریاکانی ئیتالیا هەیە. |
| حجر السكاكين | Bath-bricK | بەردی چەقۆ پاککردنەوە. |
| حجر اسواني | Syenite | بەردێکی ئاگرینی سووتاوە، گرنج گرنجە لە شاری ئەسوان لە میسر هەیە. |
| حجر، عثرة، عثار | Stumbling-blocK | بەردی هەڵ ئەنگوتن، تەگەرە، کۆسپ. |
| حجر الفلاسفة | | فەیلەبەرد، بەردی فەیلەسووفەکان،بەردێکە پێشینان وێتوویانەکە گوایە ئەگەر لە کانزای هەرزان بخرێتە دەیانکات بە کانزای گران، واتە لە کانزای بێ نرخەوە دەیکات بە کانزای بە نرخ، وەکو ئەوەی کە تەنەکە بکات بە زێڕ. |
| حجر الصلاة | Praying-stone | بەردە نوێژە، بەردێکی تەنکی پانی گەورەیە نوێژی لەسەر دەکرێت. |
| حجر الياقوت | Red zircon | بەردی یاقوت. |
| حجر السليماني، يشم، يشب حجر حرض | Gasper Rotten, stone | یەشم، بەردی بە نرخ، سلێمانی، شەوە، رەنگەکەی سەوزی مەیلەورەشەبەردێکی کلسیی داڕزاوە بۆ سافکردن بەکاردێت. |
| حجر لاتريت، بصرة | Laterite | بەردە لاتریت، بەردێکی سووری کون کونە ئاسن و ئەلەمنیۆمی تیادایە. |
| جر الكحل، اثمد | Antimony | بەردی کل. |
| حجر شجري | Coral stone | شیلان، مەرجان. |
| حجر الكهرب، كهرمان | Yellow-amber | بەردی مارەبا، کارەبا، بریتییە لە پاشماوەی رووەکیی بووبەرد (متحجر)، رەنگی زەردو رەشی هەیە، ئەگەر بخرێت لە خوری پارچە کاغەزو کا رادەکێشێت. |
| حجر الجلخ، مجلخة | Grind-stone | بەردی چەقۆ تیژکردن. |
| حجر عفن، حجر منتن | StinK-stone | بەردە بۆگەنە، جۆرە بەردێکە ئەگەر بیشکێنیت بۆگەنی لێ دێت. |
| حجر الدخنج | Malachite | (مەلاخیت)، بەردێکی نیمچە بە نرخە بریتیە لە کاربۆناتی مس وەکو شەوەو پیرۆزە. |
| حجر كبير | Great stone | زنار، گاشە، کەڤر، فەرهیت، بەردی گەورە، گابەرد، قایە، تاوێر، تاشەبەرد. |
| حجر القصدير | Tin-stone, cassiterite | (کاسیتێرایت)، بەردی جقجقە، بەردی تەنەکە، بریتی‌یە لە ئۆکسیدی تەنەکە. |
| حجر صحي | Quarantine | قورنتێنە، کەرەنتێنە، بەندی تەندروستی، دابڕینی پزیشکی. |
| حجر، استيلادي | Brood-mare | ماینی زاوزێ، ئەو ماینەی کە تەنها بۆ زاوزێ تەرخان کرابێت. |
| حجري | Stony, petrous | بەردین. |

| | | |
|---|---|---|
| حجرة خصوصية، قمرة | Cabin | کابینە، ژووری تایبەتیی. |
| حجرة مظلمة | DarK room | ژووری تاریك. |
| حجرة، غرفة | Room, chamber | ژوور، هۆدە. |
| حجز | Attachement, Confiscation | قۆرخ، گلدانەوە، دەس بەسەراگرتن، داگیرکردن، قەدەغەکردن. |
| حجز الأموال | Seize | دەست بەسەراگرتنی موڵك، دەست بەسەر موڵکداگرتن. |
| حجلة، حجل، سلكة، سركة | Partridge | سوێسکە، زرەکەو، باڵندەیەکی کێوییە لە کەو دەچێت بەڵام بچوکترە، دەنووك و قاچی زەردن. |
| حجلان، حجل | To-hop | هەنگڵەشەلێ، قونەکردن، سووسك. |
| حجلة، مخذفة، مقلاع | Sling | قۆچەقانیی، بەردەقانیی. |
| حجل، خلخال | AnKlet | پاوەنە، پەموورە، خرخاڵ. |
| حجل اسود، حيقطان، دراج، ثبت | BlacK- partridge, francolin | پۆڕ، باڵندەیەکە لە سوێسکە دەچێت لە چەم و چخوردا دەژی. |
| حجل رومي،شنار، يعقوب، حجل ارید، حجل عراقي، قبج، دجاج البراري | Starne , Common-partridge, Greater-red-lege, Chuckor | کەو، ژەرەژ، بەق ، باڵندەیەکی رەنگ خۆڵەمێشییە ژێر ملی سپییە، ئەوقێکی رەشی هەیە، دەنووك و قاچی سوورن، دەنگی خۆشە، دەنگەکەی پێی دەوترێت قاسپە. |
| حجل الحصان، حنجل | Prance, Gambol | شاخ کردن، ئەوەیە کە ئەسپ هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە و لەسەر پاشوەکانی دەوەستێت. |
| حجم | Volume, Size | قەبارە. |
| حجم ذري | Atomic-volume | قەبارەی ئەتۆمی، قەبارەی گەردیلەیی. |
| حجم جزيئي | Molar- volume, Molecular volume | قەبارە مۆلیکیوڵ، قەبارەی گەردی. |
| حجم حرج | Critical- volume | قەبارەی شلۆق، قەبارەی لە پلەی گەرمیی شلۆق و پاڵەپەستۆی شلۆقدا. |
| حجن | Bend, Curve | خواری، چەوتی. |
| حجنة | | رووەکێکە لە کۆمەڵەی دەغڵودان گوڵەکەی لە گوڵە گەنم دەچێت ریشاڵی ئاوریشمی پێوەیە لە قەراغ ئاودا دەروێت. |
| حجنة | Vine-branch | لاسکی مێشوە ترێ. |
| حجوالة، راف | Ruff | (رەف)، باڵندەیەکی ئاوییە، نێرەکەی ئەوقێکی پەڕیی لەملدایە. |
| حجيرة، خلية | Cell | (سێل)، خانە، یەکەی پێك هاتن و فرمان لە لەشی زیندەوەردا. |
| حجيرة طلائية، خلية طلائية | Fpithelicell | خانەی ئاوپۆش، خانەی داپۆشین، خانەی رووپۆش. |
| حجيجة خطاف | Swallow | پەرەسێلکە، جۆرە باڵندەیەکە. |
| حدا | Milvus | (میلڤەس)، کۆمەڵە باڵندەیەکە وەکوو کۆلارە. |
| حداة، حداية، ابو الخطاف، ابو الصلت | Kite | کۆلارە، کۆلارەی مار، کورکورە، سوورە داڵە، باڵندەیەکی گۆشت خۆرە، لەشی ئامناوەندیی و سووکەڵەیە، باڵ و کلکی درێژە، لەسەرگیانداری بچووك دەژی هەمندێکیان رەش و هەمندێکیان سوورن. |
| حداة البحر، قوبع، شفنين | SKate | (سکەیت)، کولارەی دەریا، جۆرە ماسییەکی پانی کلك درێژە لە کۆلارەی منداڵان دەچێت. |
| حداة، حمراء، اصمي | Red-Kite, Glede | (گلیدی)، کولارە سوورە، سوورە داڵە، جۆرێکە لە کۆلارە. |

| | | |
|---|---|---|
| حداة، فاس براسين | PicK-axe, Hatchet-Axe | پاچی دووسەر. |
| حداثة | Newly, Recently | سەرەتا، تازەیی، نوێیی. |
| حداد | BlacK-smith | ئاسنگەر، ئاسن کوت. |
| حدادة، معالجة الحديد | Ironsimth | ئاسنگەریی. |
| حدال | False-mallow | تۆڵەکەدرۆزنە، گیایەکە لە کۆمەڵەی تۆڵەکە گوڵی هەمەجۆرە دەگرێت. |
| حد | Sharpening, grinding | تیژکردن، ساوکردن، بیراز، میراز. |
| حد جبري | Algebraic-term | سنووری جەبریی، رادەی جەبری. |
| حد | Limit, end, Bounds | رادە، کۆتایی شت، ئاقار، پەرەسە. |
| حد | Term | (تێرم)، رادە، ئەنجامی لێکدانی ژمارەیەك یان چەند ژمارەیەك لە چەند نیبشانەیەك لە زانیاری جەبردا وەکوو (٥×ب). |
| حد، حدود | Limit, Boundary | سنوور، پەر، تخووب، کەوشەن. |
| حد السكين أو السيف | Edge, Knife-edge | دەمی چەقۆ یان شیر. |
| حد النهاية | Endpoint | خاڵی تەواوبوون، رادەی تەواوبوون وەکوو لە کرداری هاوکێش بوندا. |
| حد اقصى، حد اعلى | Maximum | (ماگزیمەم)، ئەوپەڕی، دوورترین سنوور. |
| حد ادنى | Minimum | (منیمەم)، ئەم پەڕیی، نزیکترین سنوور. |
| حد المرونة | Elastic-limit | رادەی جیڕیی، گەورەترین ئەرك کە بخرێتە سەر مادەیەکی جیڕ بەبێ ئەوەی گۆڕانێکی شێوەیی هەمیشەیی تیادا رووبدات. |
| حد مطلق | Absolute- term | رادەی بێ، پایان، رادەیی پەتیی، رادەی رووت، رادەیەکە لە بڕی جەبریدا نبشانەی تیادا نیە بەڵکو هەر ژمارەیە. |
| حدب، حدبة،تحدب، احديداب | Convexity | کووڕیی،کۆمیی، قەمووری، کۆم بوون. |
| حدب، محدب، احدب | Convex | کووڕ، کۆم، قۆقز. |
| حدب الظهر، أحدب | HumpbacK | پشت کۆم، قەموور، چوونەژوورەوەی سنگ و هاتنە دەرەوەی پشت. |
| حدبه الظهر، سنام الجمل | Hump | کۆمیی پشت، دووگی وشتر. |
| حدة، غضب | Anger | توورەیی، تووڕەو تڕزیی. |
| حدة | Sharpness , fury | تێژیی،، تیژبوون، توندیی. |
| حدة البصر، حدة الأبصار | Visual-acuity, Acuity of vision, Oxydercia, oxyblepsia | چاوتیژی، تیژی چاو، توانایی چاو بۆ جیاکردنەوەی دوو خاڵی نزیك. |
| حدة الشم | Oxyosphresia Hyperism | تیژی بۆن کردن، کەسێك بۆنکردنی تیژ بێت. |
| حدة الصوت، طبقة الصوت | Pitch | بەرزیی و نزمیی دەنگ. |
| حدة السمع | Acuityof hearing, Oryacoa | گوێ سوکیی، گوێ تیژیی. |
| حدث، ظاهرة | Phenomenon, Innovation | رووداو، دیاردە. |
| حدج، حنظل | Colocynth | گوژاڵك، کوزارك، گیایەکە لە کۆمەڵەی کوولەکە گوڵەکەی زەردە، بەرەکەی خڕو بچووکە لە کاڵەك دەچێت، زۆر تاڵە دەرمانی رەوانیی لێ دەردەهێنرێت. |
| حدجة | | باڵندەیەکە لە قەتێ دەچێت. |
| حدحود | Nannosciurus | (نانۆسیۆر)، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە سمۆرە دەچێت، رەنگەکەی قاوەیی مەیلەو زەیتونییە هێلانە لە قەدی درەختدا دەکات بەرو تۆوی روەك دەخوات. |

| | | |
|---|---|---|
| حدرة، وردة، بخصة، دمل الجفن، شحاذ العين | Sty, stye | سیچکەسلاوە، سیچکەسلاو، قنچکە، دگدگە، دومەڵێکی بچووکە لە پێڵووی چاو دەچێت. |
| حدس، تخمين | Prognostic, supposition, guess, intuition | نوقلانە، نوقلانە لێدان، بڕیاردان لەسەر شتێك راستەوخۆ بە بێ بیرکردنەوەیەکی پێشوو. |
| حدق، باذنجان | Egg-plant | ١-باینجان، باینجانی رەش. ٢- رووەکێکی درکاوییە لە کۆمەڵەی باینجان گوڵەکەی سپی مەیلەو شینە بەرەکەی زەردو مەیلەو پرتەقاڵییە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| حدقة العين، قزحية | Iris, pupil | رەشێنەی چاو، گلارەی چاو، پەلەزە، رەشکێنە. |
| حدل | Rolling | گێران، بان گێران، بان گوشین، رێکخستنی زەویی و زاری کێڵراو. |
| حدوق | HaddoK | (هادۆك)، جۆرە ماسییەکی بچووکە. |
| حدواء | North-wind | بای شەماڵ، بای باکووریی. |
| حدود، تخوم | Boundaries, Border | سنوور، مەرز، تخویب، تخووب، تاڵخ، تاخ. |
| حدوث، حصول | Happening | روودان، قەومان. |
| حدور، انحدار | Slope | لێژیی، لێژایی. |
| حدوة، نعل الفرس، حدوة الحصان | Horse-shoe | نال، نالی وڵاخ. |
| حديد صب، اهين، حديد زهر | Cast-iron, pig-iron | حەوجۆش، ئاسنی خاو، ئاسنی دارشتن، ئاهین ئاسنێکی پیسە بۆ دروستکردنی بۆری ئاو و کۆڵەکەی کارەبا بەکار دەهێنرێت. |
| حديد مطاوع | Soft-iron, Wrought-iron | ئاسنی نەرم، جلیکن ئاسنی سەختیی ساغ، ئاسنی بەرگەگر، ئاسنی گونجاو، ئاسنێکی پاکە بۆ دروست کردنی زەنگی کارەباو بزمارو لەوح بەکار ئەهێنرێت. |
| حديد قراضة، حديد فردة | Scrap-iron | ئاسنی بەکارهێنراو. |
| حديد مسبوك | Pig-iron | ئاسنی دارشتە. |
| حديد مغلون | Galvanized-iron | چینکۆ، ئاسنی بەزینك رووکەش کراو بۆ نەهێشتنی رەنگ پەیداکردن. |
| حديد | Iron, ferrum | (فیرۆم)، ئاسن، هەسن، کارك، توخمێکی کیمیاگەرییە، کێشی ئەتۆمییەکەی ٨ر٥٥ ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٢٦)، میتالێکی خۆڵەمێشییە، ماناکەی لە وشەی (فیرۆم) واتا ئاسن وەرگیراوە، نیشانەکەی F E ئێف. ئی. |
| حديد ممغطس | Magnetized-iron | ئاسنی موگناتیس کراو، ئاسنی موگناتیساویی. |
| حديد نقي | Pure-iron | چیلیك، ئاسنی پاك. |
| حديدوز | Ferrous | (فیروز)، ئاسنۆز، ئایۆنیی ئاسن کە ڤاڵەنسییەکەی واتا هاوهێزەکەی (٢) بێت. |
| حديديك | Ferric | (فیریك)، ئاسنیك ئایۆنی ئاسن کە ڤاڵەنسییەکەی (٣) بێت. |
| حديدة، محراث، محراث | Colter , plough-iron | گاسن. |
| حديقة | Garden | باخچە، باخ، دەهل. |
| حديقة عامة | ParK | باخی گشتیی، باخچەی گشتیی. |
| حديقة ازهار | Flowers-garden | باخچەیی گوڵان، گوڵزار، گوڵستان، گوڵشەن. |
| حديقة كرم | Vine-yard | رەز، باخی مێو. |
| حديقة الحيوانات | Zoologic- garden | باخچەی گیانداران، باخچەیەك بۆ کردنەوەو پەروەردەکردنی گیاندارانی هەمەجۆرە. |

| | | |
|---|---|---|
| حديقة نبات | Botanical-garden | باخچەی رووەك، باخچەیەك بۆ كۆكردنەوەو پەروەردەكردنی رووەكی هەمە جۆرە. |
| حديقة صخرية | RocK-garden | باخچەی بەردەلانی، جۆرە باخچەیەكە لەناو بەردەلانیدا دروست دەكرێت. |
| حديبة | Callus | ئاوساویی، گرێ، هەر گرێیەك، لە لەشی گیاندار، یان رووەكدا پەیدا بێت. |
| حديث | New, recent | تازە، نوێ. |
| حديث | Conversation | وتە، وتار، گۆتە، گوتە، وتن، گفت، ئاخافتن.. |
| حذاء | Shoes | پێڵاو، قۆندەرە، پێتاو، كەوش، كلاش، گێوە، پاپەجانە. |
| حذاء، قندرجي | ShoemaKer | پێڵاو دروو، قۆندەرەچیی. |
| حذاء قديم | Old-shoes | شەكاڵ، شەقاڵ، كەوشەكۆن، قۆندەرەكۆن. |
| حذاء المطر | Top-boots | پێڵاوی باران. |
| حذاء الثلج | Snow-boots | پێتاو. |
| حذاء طويل، جزمة | Boots | جزمە، پۆستاڵ، چەكمە. |
| حذاء الست، خف السيدة | Ladys- slipper | پێڵاوی خانم، گیایەكی دەشتەكییە گوڵــی سپی یـان پەمبـەی یـان زەرد دەگرێت لە پێڵاو یان سۆڵ دەچێت. |
| حذار | Take-care-of, aware | ئاگاداریی، وریای. |
| حذافي | Young-ass | جاش، جاشەكەر. |
| حذاقة، مهارة | SKill | شارەزایی، وریایی، پسپۆریی، كارسازیی، سەلیقە. |
| حذر | Care | وریایی، ئاگاداریی. |
| حذر | Careful | وریا، ئاگادار. |
| حذف | Ellmination | لابردن، پەراندن، سڕینەوە، فڕێدان، چزكردن، كوژاندنەوە. |
| حذف، منية، شرشير، كركج، هرارة | Teal, garganey garbay | سۆنە، مراویەكی بچكۆلەی دەریاییە، پشتی قاوەییەو میلی سپیی تێدایە سەری خەنەییە. |
| حذفة | Limb | لق، گەڵا، پەلك. |
| حذق، حذاقة | SKill | شارەزایی،پسپۆریی، كارسازیی، سەلیقە. |
| حذل | Resin | (رێسین) زەمقێكی سوورە هەندێك درەخت دەری دەدات دوای نەخۆشیی یان بریندار بوون. |
| حذلوم | Hartetbeest | جۆرێكە لە مانگا كێویی. |
| حذو | Shoeing | نال كردنی وڵاخ، نال كردن، نال بەندیی. |
| حذو، ازاء | Opposite-to | بەرامبەر. |
| حذيرة | Labor-pains | بەرەژان، ژانی ئافرەت بەر لە منداڵ بوون. |
| حر، طليق | Free | ئازاد،بەرەڵا، سەربەست. |
| حر | Lanner | (لانەر)، جیرێكە لە هەڵۆ بچووكە سەرەكەی سپیە. |
| حر المعيشة | Free living | ژیان ئازاد، ژیان سەربەست، هەر گیاندارێك مشەخۆر نەبێت. |
| حراجة | Criticalness | شلۆقیی، ناهەمواریی، لەقیی، |
| حرات | Igneous-rocK | بەردە سووتەڵە، بەردی ئاگرین. |
| حراثة | Ploughing | كێلان، جووت كردن، كێڵانی زەوی. |
| حراث | Plough-man | جووتیار. |
| حراثة | | (راجع حالوش). |

| | | |
|---|---|---|
| حرارة | Heat | گەرمی، گەرمای. |
| حراري، مسعري | Calory, Thermal | (کالۆری)، گەرمی، شتێك پەیوەندی هەبێت بە گەرمییەوە. |
| حرارة كامنة | Latent-heat | گەرمی شاراوە، گەرمی مات، ئەو گەرمی‌یەی کە مادە هەڵی دەمژێت یان دەیداتەوە لە کاتی گۆڕاندا لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر. |
| حرارة الأنصهار الكامنة | Latentheat of fusion | گەرمی شلەوەبوونی شاراوە، گەرمیی شلەوەبوونی مات. |
| حرارة التبخر الكامنة | Latentheat of vaporization | گەرمیی هەڵمێنیی شاراوە. |
| حرارة الأنصهار | Heat of fusion | گەرمی شلەوەبوون. |
| حرارة ذرية | Atomic-heat | گەرمیی ئەتۆمیی، گەرمیی گەردیلەیی ئەنجامی لێکدانی کێشی گەردیلەیی لە گەرمیی جۆریی. |
| حرارة التكوين، حرارة الأتحاد، حرارة التكون | Heat of formation heat of combination | گەرمی دروست کردن، گەرمیی دروست بوون، گەرمیی یەك گرتن، گەرمیی پێکهاتن، گەرمیی پەیدابوون. |
| حرارة التفاعل | Heat of reaction | گەرمیی کارلێکردن. |
| حرارة التبخر | Heat of vaporization | گەرمیی هەڵمین. |
| حرارة الأحتراق | Heat of combustion | گەرمیی سووتان. |
| حرارة التسامي | Heat of sublimation | گەرمیی بەرزبوونەوە، گەرمیی هەڵچوون. |
| حرارة الذوبان | Heat of- solution | گەرمی توانەوە. |
| حرارة طبيعية، حرارة غريزية | | گەرمی سروشتیی، گەرمی سروشتی لەشی گیاندار. |
| حرارة مطلقة | Absolute-heat | گەرمیی بێ پایان، گەرمی پەتیی. |
| حرارة نوعية | Specific heat | گەرمی جۆریی. |
| حرارة حرجة | Critical-heat | گەرمی شلۆق. |
| حرافة، حرافة المذاق | Pungence | تووتن تیژیی. |
| حراق، لذاع | Pungent | توون، تیژ، سووتێنەر. |
| حراقة، منفطة | Blister -plaster | پلاستەری لیر. |
| حراشف الحية | Slough | کاژی مار. |
| حراسة | Guardianship | پاسەوانی، هیشك، نێشك گرتن. |
| حراقة، سفينة حربية | Torpedo-boat | ١- بەلەمی جەنگی. |
| حرام، بطانية | BlanKet, rug | مەرج، پۆیەشمین، بەتانیا، بەتوو. |
| حرامي، لص | Thief | دز،دەست پیسیی. |
| حراري كهربائي | Electro-thermal | پەیداکردنی گەرمیی، بە کارەبا، گەرمیی کارەبایی. |
| حراري ضوئي | Photo-thermic | گەرمیی رووناکیی، پەیوەندی هەیە بەگەرمی و رووناکییەوە. |
| حراق، حراق | Spadix | گوڵی نێری خورما. |
| حراق، حريق، قراص | Stinging-nettle | گەزنە، بەیبوونەکێویلە، رووەکێکە گەڵاکەی تووکی زبری پێوەیە دەچێت بە پێستی مرۆڤدا. |
| حراق، صوفان | Tinder, touchwood | پوشوو، گیایەکی وشکە، زوو دەسووتێت لەبەر ئەوە ئاگری پێ دەکرێتەوە. |
| جرابية | Celastrus, wax-worK-shrub | (سیلاسترەس)، دەوەنی مۆم، دارسوونگیی،دارو دەوەنێکی کشتوکاڵی و رازاندنەوەی ناوچە گەرمەکانە، گوڵەکەی سەوزە، بەرەکەی سوورە تەختەکەی رەقە بۆ دروستکردنی سونگیی بەکار دەهێنرا. |

| | | |
|---|---|---|
| حراجة، علم غابات | Forestry | دارستانیی، زانیاری دارستان. |
| حراج، مزاد | Public- sale, auction | هەراج، مەزات. |
| حربة | Spear-head | قەمە، سونگیی، قەسەتۆرە، زەرگ، نێزە، سەرەتیر، سوونی. |
| حربة البندقية | Bayonet | سونگیی، سونیێ. |
| حرب | Battle, war | شەڕ، جەنگ. |
| حرب اهلية | civil-war | جەنگی برا کوژی، شەڕی براکوژی، شەڕی ناوخۆ. |
| حرب باردة | Cold war | شەڕەقسە، شەڕێکی سارد. |
| حرب العصابات | Guerilla-war | شەڕی چەتەگەریی. |
| حرب جرثومية | Microbic-warfare | جەنگیی میکرۆبیی، جەنگێکە میکرۆبی تێدا بەکار دەهێنرێت دژی دوژمن، وەکوو میکرۆبی وەناق و کۆلێراو رەشەگرانەتا . هتد. |
| حرب بايولوجية | | جەنگی بایولوجی، جەنگی زیندەوەرزانیی. |
| حرب كيميائية | Chemical-warfare | جەنگی کیمیایی، بەکارهێنانی گازی ژەهر لە جەنگدا. |
| حربي | Military | جەنگیی. |
| حرباء، حرباءة، بربختي | Chameleon | خۆرپەرست، تیرتیرە، مارپەلاس، خەمەگرو،کەرباشە،کەرپەسەد کۆستەڵ، جۆرە مارمێلکەیەکە رەنگەکەی دەگۆڕێت بەکاری تیشکی خۆر، درێژییەکەی نزیکەی (٤-٦) سم دەبێت، جاری وا هەیە خۆی فوودەدات وەکوو تۆپێکی خڕی لێ دێت وە بە زۆری لەسەر درەخت دەژی، کلکی دەئاڵێنێت لە لقی درەختەوە، وە بە هۆی زمانە درێژەکەیەوە مێش و مەگەز دەگرێت و دەیخوات. |
| حرباء امريكية | American-chameleon | خۆرپەرستیی ئەمریکیی، جۆرێکە لەخۆرپەرست نێرەکەی توورەکەیەکی پەمبەیی بریسکەدار وا بەژێر قورگیەوە هەندێك جار توورەکەکە بلاو دەکاتەوە بۆ مەبەستی سەرنج راکێشانی مێیەکەی یان هەڕەشەکردن لە دوژمن. |
| حربون، رمح | Lance | جۆرە رمێکە بۆ راوکردنی نەهەنگ بەکار دەهێنرێت. |
| حريث | Astragale annulair | رووەکێکی دەشتەکییە مەیلەو رەشە گوڵەکەی سپییە بۆ لەوەڕ باشە. |
| حريش، حريبيش، حية قرناء | Horned-viper, Cerastes | ماری شاخدار، ئەژدیها، ئاژدیها. |
| حربة شاري، مصعقة، دافع الصاعقة | Lightning conductor | تریشقەگر، بەربەستی تریشقە، بریتیە لە شیشێکی پۆلایی نووك تیژ لەسەر پۆپەی خانوو و بینا دادەنرێت وە بە زنجیرێك دەگەیێنرێت بۆ زەویی بۆ مەبەستی پاراستنی ئەو خانوو و بینایە لە کاری تریشقە. |
| خريط، حرابيث حشيشة الداحس، حريط كردي | Paronichia Kurdica | (پارونیکیا)، گیایەکی دەشتەکیی پزیشکییە لە کۆمەڵەی مێخەك، گوڵەکەی وردە، گەڵاکەی زیوییە. |
| حريق، حلبوب | French-mercury | جیومیی، فەرەنسیی، گیایەکی دەشتەکیی پزیشکییە لەناو دەغڵودانـدا دەڕوێت هەندێکی ژەهرە. |
| حرة، حرف، رشاد بري | water cress | کووزەڵە، تەرەتیزە کێویلە، رووەکێکی ئاوییە. |
| حرة | Stony-land | زەویی بەردەڵانی رەش. |
| حرة | StinK-weed | گیایەکی دەشتەکیی پزیشکییە،گەڵاکەی توونە گوڵەکەی زەردە. |
| حرث، حراثة، كرب، كراب | Ploughing | کێڵان، کێڵانی زەویی بە بێڵ یان گاسن یان تراکتۆر. |

| | | |
|---|---|---|
| حرج | Crime, sin | سووچ، گوناه، تەنگانە، شلۆق. |
| حرج | Cirtical | ناهەموار، لەنگی، لەق ، لارەسەنگ. |
| حرجة، حرج | Forest, wood | جەنگەل، بێشەلان، دارستان. |
| حرجف | Wind(Violent and cold) | بایەکی ساردی بەهێز. |
| حرجل | Argel | (ئەرجیل)، دەوەنێکە گەڵاکەی پزیشکیە گوڵەکەی وردە. |
| حرجوان، جرادة | Locust | کوللە، کولو. |
| حردي، هردي | Sheaf of reeds | چەپکە قامیش کە دەخرێتە سەر دارەرای بن میچی سەربان. |
| حرد | To-be | تۆران، زیزی، زویریی. |
| حردان، حارد | Petulant | تورلو، زیز، زویر. |
| حردقة، حرقدة، تفاحة ادم | Adams-apple | قورقوراگە.کەڵەبابەی گەردەن. |
| حردب، حب العشرق | Seed of circaea, aleppo-senna | سینەمەکیی حەڵەبیی، رووەکێکە دەنکەکەی لە دەنکی نیسك دەچێت. |
| حرذون، حردون، حرضون، ام حبين، حبينة، قاضي الجبل، عضر فوط، ضب | Agama, judge of the desert, stellio | بڵقەدەر، دولقەدەر، قۆریی، مارمۆتك، قومقمۆکە، جۆرە مارمێلکەیەکە پوولەکەکانی کلکی گرێ گرێیە، سەرو ملی درکی بچووکی پێوەیە. |
| حرز | Keeping | پاراستن، پارێزگاریی. |
| حرس | Guard | پاساول، پاسەوان، ئێشکچی. |
| حرساف، حرشاف | Locust | کوللە، کولو. |
| حرشة، حرشاء، خردل بري | Charlock | خەرتە لە کێویلە، رووەکێکە لە سەر زەویی رادەکشێت و پان دەبێتەوە ، زبرەو نێرکێکی کلۆری هەیەو سەرێکی خڕی هەیە ئەگەر مرۆڤ بیلێستەوە دەتووسێت بە زمانەوە. |
| حرشة، خشونة | Rougness | زبریی. |
| حرش،حرج،حرجة | Forest, wood | بێشە، چڕستان، زەبەنگ، پێشەلان، دارستان. |
| حرش، خشن | Rough, scabrous | زبر. |
| حرشون | | نووسنەك، هەرواڵە، رووەکێکە بە لەشەوە دەنووسێت. |
| حرشون | | جۆرە ماسیەکە. |
| حرشف القدس، طرطوف، قلقاس رومي، عباد الشمس المسقولي | Jerusalem-artichoke, canada-potato | سێوی بن ئەرز، سێڵك، رووەکێکە لە گوڵە بەرۆژە دەچێت سەلکی ژێر زەوی هەیە ، شیرینە دەخورێت و دەکرێتە ترشیاتەوە. |
| حرشف، حرشفة، | Scale | تویکڵ، گەڵایەکی ئەستور. |
| حرشف السمكة، فلوس السمك | Scale of fish | پوولەکەیی ماسیی. |
| حرشف، هيشر، قردون | Cardoon.artichoKe | کەرتەشیی، شەکرۆك، جۆرە رووەکێکە لە کنگر دەچێت گەڵاکەی پان و درکاوییە گوڵەکەی بنەوشەیی یان شینە، دەخورێت. |
| حرشف السطوح | Sempervivum- tectorum | پوولەکەی سەربان، گیایەکی گۆشتنە، گوڵەکەی پەمبەیە بۆ مەبەستی رازاندنەوەو پزیشکی بەکاردێت. |
| حرشف بري، كعيب | MilK- thistle | چاو، بازە، کنگر، گیایەکی درکاوییە گەڵاکەی پانە دەکرێت بە چێشت. |
| حرشفيات الأجنحة | Lepidoptera | باڵ پوولەکەییەکان، کۆمەڵە مێروویەکە وەکوو پەپوولەو کرمی ئاوریشم. |

| | | |
|---|---|---|
| حرشفي | Scaly | پولەکەیی. |
| حرض | Degeneration | نشوستی، شکستیی، دانەدواوە، پووکانەوە. |
| حرض، قلي، شوك احمر، اشنان | Salt wort, glass-wort, Kali | ئەسپۆن، جۆرە گیایەکە مادەی سۆدیۆم کاربۆنەیتی لێ دەردەهێنرێت بۆ دروستکردنی سابوون. |
| حرضون | Agama | (ئەگاما)، قۆریی، جۆرە مارمێلکەیەکە لەناو بەردەلاّندا دەژی. |
| حرطاب | Hygrothermo-graph | (هایگرۆثیرمۆگراف)، تۆمارکەری گەرمیی و شێ، دەزگایەکە لە خۆیەوە بەردەوام پلەی گەرمی و شێی ڕێژەیی ئەو شوێنە تۆمار دەکات. |
| حرف | Letter | پیت. |
| حرف، حافة | Edge, border | قەراغ، لێوار. |
| حرف مطبعي | Type, printing-type, letter | پیتی چاپکردن، پیتی چاپخانە. |
| حرف، رشاد | Garden- cress | تەرەتیزە، گیایەکە گەلاّکەی توونە دەخورێت. |
| حرف، الماء، رشاد بري، قرة العين | Water-cress, brown-cress , Wild-cress | کووزەلّە، تەرەتیزە کێویلە، بێزروو.گیایەکی دەشتەکییە لە قەراغ ئاودا دەڕوێت دەکرێت بە زەلاّتەو شۆربا. |
| حرف البحر، حرق البحر | Medicinal eggplant | باینجانی دەرمان، جۆرە باینجانێکە بۆ دەرمان بەکاردێت. |
| حرف بري | Wild- rocket | کووزەلّە کێویلە، جۆرێکە لە کووزەلە تامەکەی توونە، گوڵەکەی سپییە. |
| حرفرف، رشاد بري | Pepper- grass | تەرەتیزە کێویلە. |
| حرفة، اندلسية | Candy- tuff, Candy-tuft | (کاندی تەف)، دەوەنێکە گوڵەکەی بەشێوەی هێشووەو بە زۆری سپییە. |
| حرفة، مهنة | Profession | پیشە. |
| حرفة يدوية | Trade | ئیشی دەست. |
| حرفة شعبية | National-trades | پیشە میلییەکان، پیشە خۆماڵییەکان، وەکوو ئیشی کلّێنەو جلو بەرگەو کاسەو کەوچك. |
| حرق، سمط | Burning, Ignition | سووتاویی، سووتان، سووتاندن،گڕتێبەردان، شەوتاندن. |
| حرق من الدرجة الأولى | | سووتاویی پلەی یەکەم. |
| حرق وانسلاخ | | دیلّۆخان، چەکمەبوون. |
| حرقة | Ardour, vehemence | کزانەوە، چووزانەوە، درووخە، کسپە. |
| حرق القلب، حرقان القلب | Heart-burn, cardia lgia | دلّەکزێ، کسپەی دل، چووزانەوەی گەدە. |
| حرقد، عكرة | Root of-tongue | رەگیی زمان، ریشەی زمان. |
| حرق، رنق | African-hemp | گووشی ئەفریقیی، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی گوش، قەدەکەی خشۆکە، لەژێر زەویدا، گوڵەکەی بەشێوەی هێشووی هەمە جۆرەیە. |
| حرقوق، ارجوان، شجرة الحب | Love-tree, red-bud | ئەرخەوان، درەختی دلّداریی، درەختی خۆشەویستیی. |
| حرقس | | (راجع حرساف). |
| حرقوس، برغوث | Flea | کێچ. |
| حرقفة، رأس الورك، حرقوف، عظم حرقفي | Coxa, hip-bone, Ilium | کلۆت، کلۆك،کولّمك، ئێسقانیی سێ بەندە، ئەوەی کە دەکەوێتە ژێر کەلەکەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| حرقفي | Iliac | كلۆتيى. |
| حرقص، حرقوص، دخال الاذن، ثاقب الاذن | Earwing | گوێ كونـدەرە، جۆرە مێروويەكـە لـە شێوەی هـەزار پـێ دەچێتـە نـاو كونچكەوە. |
| حركة | Movement, Motion | جووڵە، هەژان، جووڵانەوە، بزووتن، جمان، جمە، بزووتنەوە، لڤین. |
| حركة انتقالية | Translatory-movement, Translation- motion, Locomotion | جووڵانەوەی گواستنەوەیی، جێگا گۆڕكێ |
| حركة اهتزازية | Vibratory-motion | لەرزە جووڵە. |
| حركة تذبذبة | Oscillatory-motion | لەرە جووڵە، جووڵەلەرە، جووڵانەوەی لەرینەوەیی. |
| حركة دودية | Peristalsis | كرمە جووڵە، جوڵانی كرمی، جووڵانەوەی كرمیی، جۆرە جووڵانەوەیەكە لە جووڵانەوەی كرم دەچێت. |
| حركة نسبية | Relative-motion | رێژەجووڵە،، جووڵانەوەی رادەی. |
| حركة منسقة | Uniform-motion | جووڵەی چوون یەك، جووڵەی تەنێك لەسەر هێڵێكی راست بە خێرایەكی جێگیر. |
| حركة ارادية | Voluntary-motion | ویستەجووڵە، جووڵەی خۆویست، خۆجووڵانەوە، ویستەجمان. |
| حركة غير ارادية | Involuntary-motion | نەویستەجووڵە، نەویستەجمان. |
| حركة انعكاسية | Reflex-motion, reversed-motion | جووڵەی پێچەوانە، جمانی پێچەوانە، جووڵانەوەی پێچەوانەیی. |
| حركة موجية، حركة تموجية | | جووڵانەوەی شەپۆلی. |
| حركة تراجعية | Retreat-motion, recession-motion | جووڵانـی پاشـگەزبوونەوەیی بزووتنـەوەی بـەرەودوا، بزووتنـەوەی هاتنـە دواوە. |
| حركة توافقية | Harmonic-motion | جووڵەی هارمۆنیك، جووڵەی پـەك كـەوتوو، جۆرە جووڵانەوەیـەكی نۆرمیـە تەنێكی جیر پەیدای دەكات. |
| حركة توافقية بسيطة | Simple-harmonic-motion | جووڵانەوەی یەك كەوتوویی ساكار، جووڵەی هارمۆنێكی ساكار. |
| حركة دورانية | Gyroscopic- motion | جووڵـەی جایرۆسكۆپی، سوورە جـووڵان، جوڵانـی سـوڕانەوەیی، جوڵـەی سووڕانەوەیی. |
| حركة جزيئية | Molecular-motion | جووڵانەوەی گەردەكان (مولیكیولەكان) لەناو تەنەكاندا. |
| حركة دورية | Peridic-motion | جووڵەی خولیی. |
| حركة ذاتية | Automatic | (ئۆتۆماتیك)، خۆجمە، جووڵانەوەی خۆیی. |
| حركة ترلوحية، حركة تناوبية | Shuttle-movement | جوڵەی یەك لە دوای یەك. |
| حركة مفاجئة | Sudden-motion | فرتە، قەل فڕ، جووڵەی لە پڕ. |
| حركة براونية | Brownian-motion | جووڵەی براونیی، جمەی براونی، جووڵانەوەیەكی بەردەوامی خێرایی بێ سـەرو شـوێنە لـە تەنۆكـەی مـادە ملـەكان دا، دەردەكـەوێت كـاتێك كـە بـەرمۆلیكیولی ئـەو شـلەیە دەكـەون كـە وان تیـایدا، وە ئەمـەش بـە میكرۆسكۆب دەبینرێت. |
| حركة انسيابية | Streaming-movement | جووڵەی رەوان. |
| حركات ارضية، تشويهية | Diastrophism | (دایاسترۆفیزم)، جووڵەكانی زەویی، ئەنجامی جوڵانەوەی پارچەیـەك لە زەوی كە دەبێتە هۆی پەیدابوونی درزو كەندو چیاو كیشوەر. |

| | | |
|---|---|---|
| حركي (ديناميكي) | Dynamic | جوڵەومیی، جووڵەیی. |
| حرك | Restless, BrisK | بزێو، عەجوول. |
| حركيات | Kinetics | (کینکتیکس) (١) جووڵە، جمان.٢- خوێندنی خێراییی کارلێکردنە کیمیاییەکان. |
| حرمدة | Arctia | (ئەرکتیا)، مێروویەکە لە پەپوولە دەچێت. |
| حرمة | Rut | بە کەڵیی، بە تەڵەیی، ئارەزووی جووتکردن، لە مێی شیردەردا. |
| حرمسة | Burning | سووتانی گیای باخچەو کێڵگە بۆ مەبەستی کشتوکاڵ کردن. |
| حرمل،خمخم، حمحم، سذاب بري | Harmal, wild-rue, syrian-rue | ئەسپەند، ئەسپەنەر ئەسپەندەر، ڤانگ، رووەکێکی قیتە، بۆنێکی بۆگەن و گەڵایەکی سەوزی مەیلەو رەشی هەیە، گەڵاکانیشی بە دەوروپشتی لقەکانیەوە ریزبوون، گوڵەکەی سپیییە لەسەر یەك ئاقارن، بەرێکی خڕی بچووکی هەیە، رەنگەکەی سووری مەیلەو بنەوشەیە، وە تۆوەکەی لە کونجی دەچێت بەڵام تاڵە، بەشێوەی دەرمانی کرم، وە دژی سکچوون، وە بۆ نەخۆشی جومگەکان بەکار دەهێنرێت، هەروەها تۆوەکەی دەسووتێنن بۆ چاوەزار. |
| حرمل ابيض، ثوم ذهبي | Moly, yellow-garlic | ئەسپەندی سپیی، ئەسپەنەری سپیی ، سیری زەرد. |
| حرملة، حرملان | Peganum- harmala, Sarcostemma | (سارکۆستیما)، دەوەنێکی دەشتەکیی پزیشکیی‌یە، شیراوێکی لینج لە قەدەکەی دەردەهێنرێت بەشێوەی دەرمانی رەوانی بەکاردێت. |
| حرملة، غطاء للكتف | Cape | کۆڵوانە، چارۆکە، چتە، چەفتە. |
| ح . ر . ن، حامض رايبونيوكليك | RNA , ribo nucleic-acid | ئار، ئێن ، ئەی، کورتەی ناوی ترشیی رایبۆنیوکلیك. |
| حروقة، حروق، صوفان | Tinder-Touch-wood | پووشوو، رووەکێکی درکاوییە پووشەکەی زۆر دەسووتێت لەبەر ئەوە بۆ ئاگرکردنەوە بەکاردێت. |
| حرون، عنيد | Stubborn , stiff | سەمەند، سرك، چەمووش، سەرکێش. |
| حرون | Rocky- earth | زەویی بەردەڵان، کە بەردی رەشی تیابێت. |
| حرور، شوب | Hot- wind | بایەکی گەرم کە بە شەو هەڵ بکات. |
| حروة، حرقة في الحلق و الصدر | Heartburn | دڵەکزێ. |
| حرير أبريسم | SilK | ئاوریشم، هەوریشم، دەزوویەکە لە لایەن کرمی ئاوریشمەوە دەردەدرێ. |
| حرير طبيعي | Natural- silK | ئاوریشمی سرووشتیی. |
| حرير صناعي | Rayon, artificial-silK | (رایۆن)، ئاوریشمی دەستکرد، هەوریشمی دەستکرد، مادەیەکە لە لۆکەو تەختە دروست دەکرێت، قوماشی لێ دەچنرێت بەڵام ئەوەندەی ئاوریشمی سروشتی قایم نیە. |
| حرير صخري، اسبست | Asbestos | (ئەسبێست)، (ئەسبەست)، ئاوریشمی بەردین، بەردە هەوریشم. |
| حريد، حريت | Scarus-harid , parrot-fish | (سکارۆس)، ماسیەتووتیی، ماسییەکی دەریایی رەنگینی گۆشت خۆشە. |
| حريق | Fire | ئاگر بەربوونەوە، ئاگر کەوتنەوە، سووتان، سووتمان. |
| حريق، قريص، حراق، قراص | Stinging- nettle | گەزنە، بەیبوونە کێویلە، گیایەکی دەشتەکیی پزیشکییە گەڵاکەی توکنە تووکەکەی ئاوگێکی سووتێنەر دەردەدات، پێست دەسووتێنێت گوڵەکەی سەوزە. |
| حريش، ام اربع و اربعين | Scolopendra, centiped | هەزارپێ، خش خشخشۆك، زیوو، پرپە، شەمار. |

| | | |
|---|---|---|
| حريف، لاذع | Acrid | توون، تيژ، تامى تونو تيژ. |
| حريص | Covetus | هەتەر، سوور. |
| حريش البحر، كركدن البحر، قوقي، يامور | Narwhal | (ناروال)، كەركەدەنى دەريا، جۆرە نەهەنگێكە كەڵبەيەكى درێژى هەيە لە شاخ دەچێت. |
| حريش، كركدن، حرميس، هرميس، وحيد القرن | Rhinoceros | يەك شاخە، كەركەدەن. |
| حريرة، سعرة | Calori | (كالۆرى)، يەكەى پێوانى بڕى گەرمى. |
| حريسة، زريبة الطير، مدجنة الطير | StocK-still | كولانەى باڵندەى ماڵى. |
| حزا، شبث بري | Wild-dill, wild-anethum | شويتە، كێويلە. |
| حزام الكتف | Shoulder-girdle, pectoral girdle | پشتێنەى شان، ئەو پشتێنە ئێسكىيەى كە هەردوو باڵ دەبەستن بە بەژنى گياندارەوە. |
| حزام الحوض | Pelvic-girdle | پشتێنەى كەمەر، پشتێنەى سێبەندە، ئەو پشتێنەى ئێسكىيەى كە هەردوو لاق دەبەستن بە بەژنى گياندارەوە. |
| حزام | Girdle | پشتێن، كەمەربەند، شوتك، تەگەبەند، ناڵكيل، كەمەرە. |
| حزام ناقل | Conveyer- belt | قايشى گواستنەوە، پشتێنى گواستنەوە. |
| حزام النجاة من الغرق | Life-belt.safety-belt | پشتێنى رزگاربوون، پشتێنى سەلامەتى. |
| حزام الزلازل | ErthquaKe-belt | پشتێنەى بوومەلەرزە، ئەو ناوچانەى كە دەشێن بوومەلەرزەيان تيادا رووبدات چونكە توێكڵى زەوى تياياندا تەنكە وەكوو لە يابان. |
| حزام الخراطيش | Cartridge belt | فيشەك دان، فيشەك لغ، رەخت، خەريتە. |
| حزام ذهبي، حزام فضي | Gold belt | پشتێنى زێڕ، پشتێنى زيو،كەمەرە. |
| حزام الفتق، حفاظ | Rupture-truss, surgical-truss | پشتێنى قۆڕيى. |
| حزام فان الن | Van- allen belt | (پشتێنەى ڤان ئەلن)، پشتێنەيەكى ئەلقەيە لە تيشك لە پرۆتۆنو ئەليكترۆنى ووزە بەرز پێكهاتووە دەورى خڕۆكى زەوى داوە لە بەرزى (٦٤٠) كليۆمەترەوە هەتا (٦٤٠٠٠) كم. |
| حزام السرج، حزام الدابة | Saddle-girth | تەنگەى وڵاخ، قەباسە، تەنگەى ژێرسك. |
| حزام البطن، حزام الخصر | Corset | (كورسێ)، سك بەند، پشتێنى سكو كەلەكە. |
| حزار، كشة العجوز، حزاز الصخر، اشنة | Mosses, Lichen | گڵەوەن، قەوزەى سەر بەرد، قەوزەى گوێسەبانە، رووەكێكى سەرەتاى ساكارە لەسەر بەردو ديوارو توێكڵى درەخت دەروێت ، بەرگرى گۆڕانەكانى سروشت دەكات وە بە تايبەتى سەرما. |
| حزازيات | Bryophyta | (برايۆفاتيا)، گڵەوەزەكان، كەڤزەكان، كۆمەڵە رووەكێكە وەكوو قەوزەى گوێسوانە. |
| حزاز | Canary | كەنارى، باڵندەيەكى بچووكى دەنگ خۆشى زەردە. |
| حزاز، قشرة الراس | Dandruff | كرێشى سەر. |
| حزازة، قوبة، قوباء | Scurf, ring worm, Tetter, herpes | (سكەرف)، تووك رووتانەوە، نەخۆشىيەكى پێستييە دەبێتە هۆى تووك هەڵوەرين. |
| حزة، حز | Siice | قاش، كوز، كوت، تەلاش. |
| حزة | Quarre | قڵيش، قڵيشێكە دەكرێتە قەدو لقى هەنديك رووەكەوە بۆ مەبەستى دەردانى كەتيرەو مادەى شيراو. |

| | | |
|---|---|---|
| حزر | Guessing | قەبلاندن. |
| حز | Notch | درز، روکان. |
| حزم، رزم | To- sheaf, packing | بەستن، پێچانەوە. |
| حزمة | Beam | چەپك. |
| حزمة وعائية | Vascular-beam, vascular-bundle | چەپكە بۆریی، گورزەی بۆریی. |
| حزمة عصبية | Funiculus | چەپکی دەماریی. |
| حزمة حطب | Sheaf | بارەدار، گورزەدار. |
| حزمة | Bundle | مەڵۆ، چەپك، گورزە، دەسك، قول، تاخە، گرشە، قەفل، شارا تەبارە، گێشە. |
| حزمة ضوئية | Beam of light | چەپکی تیشکی، کۆمەڵێکی نزیك لە یەکی تیشکیی رووناکی. |
| حزمة، رزمة، ربطة، صرة | PacKage, parcel, Bundle | بەستەك. |
| حزن | Sadness, sorrow, Grief | پەژارە، خەم، دڵتەنگیی، پەستی، خەفەت، ماتەمینی، داخ، دڵگیری، کەسەر. |
| حزنبل، عيون النمر | Ochna, Yarrow, nosebleed, milfoil | گیا دوورپشکە، قاپەکوڵە، دۆ بەسەرە، سەر بەدۆگیایەکی بۆنخۆشە گەڵاکەی دداندارە، گوڵەکەی سپی یێ شینە، بەرەکەی لە ترێ دەچێت ناخورێت، هەروەها رووەکێکی پزیشکی تاڵە بەهێزکەرو وریاکەرەوەیە بۆ لەش. |
| حزورة، احجية | Riddle, puzzle | مەتەڵ. |
| حزيران، يونيو (١-٢١) (٢٢-٣٠) | June | مانگی شەشەم سی رۆژە، جۆزەردان، باران بڕان، جۆدرەو، حوزەیران، پووش پەڕ. |
| حزيران | | جۆرە باڵندەیەکی بۆرکەڵەی بچووکە. |
| حزين | Sad, Grieved | دڵتەنگ، دڵگیر، خەفەتبار، خەمبار. |
| حس، احساس | Sense, Feeling | هەست، نەست، هەستکردن. |
| حساب | Arithmatic, calculation, Counting | ژمێرە، ژمارە،ژماردن، هەژمار. |
| حساء شورية | Soup | شۆربا، شلە، زەلکە. |
| حساء العدس | Lentil-soup | نیسکێن، شۆربای نیسك. |
| حساس | Sensitive, sensible | هەستکەر، بەهەست، هەستەوەر. |
| حساسية | Sensitivity | هەستکەریی، هەستایەتیی، هەستەوەریی. |
| حساس، هف، هازبا، قشقوش | Silverside, sand-smelt | لازیویی، جۆرە ماسییەکە پەڕەکەی درکاوییە گۆشتەکەی خۆشە. |
| حسام، سيف | Sword | شیر، ئامرازێکە لە جەنگدا بەکاردێت. |
| حسارة، قردمان | Bitter-cress | تەرەتیزە تاڵە، گیایەکی دەشتەکییە تۆوەکەی وردو زەردو توونە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| حساب التكامل | Integral-calculus | ژمێرەی تەواوکاریی، لقێکە لە زانیاریی ماتماتیکیی، بەرز مەبەستەکەی دۆزینەوەی ئەو پەیوەندییە ماتماتیکیانەیە کە گۆڕاوەکان دەبەستن بە یەکترییەوە بە زانینی تێکڕایی گۆڕان. |
| حساب التفاضل | Differential, calculus | ژمێرەی جیاکاریی، لقێکە لە زانیاریی ماتماتیکی بەرز باسی گۆڕانی زۆر کەم دەکات لە بڕەکاندا. |
| حساب المثلثات | Trigonometry | زانیاریی سێ گۆشەکان، ژمێرەی سێ گۆشەکان. |

| | | |
|---|---|---|
| حساسية | Allergy | (ئەلێرجی)، هەستیایەتیی، بریتی‌یە لە لیرو رشانەوەو سەرئێشە هتد، بەهۆی هەندێك خواردەمەنیی و دەرمان خواردنەوە یان بۆن یان هەندێك شتی ترەوە رو دەدات. |
| حساسة، مستحية | Sensitive-plant, Humble- plant | رووەکی شەرمن، گوڵەکەی سورە ئەگەر دەست لە گەڵاکەی بدەی لوول دەبێت. |
| حساس للضوء | Light- sensitive, photo-sensitive | رووناکیی بردەڵە، هەستیار بۆ رووناکیی، هەر مادەیەکی کیمیای کە کارلێك کردنی کیمیای تیا روبدات لە ئەنجامی هەڵمژینی وزەی رووناکی‌یەوە. |
| حسب | According-to | بە گوێرەی ، بە پێی. |
| حسب، شبيط | Burr-grass, panic-grass | گیادڕکە، گیا زبرە، گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵودان بۆ لەوەڕ باشە، بەرەکەی دڕکاویە. |
| حسبة، مهق | Albinism | هۆڵی، نەبوونی رەنگ لە چاو و قژو پێستدا واتا لەو کەسانەدا کە قژیان سپی‌یەو پێستیان سوورەو چاویان کزە. |
| حس، حص | Champelure | سەرمابردن، کە رووەك سەرما دەیبات. |
| حسد | Covetousness | رەشك، بەخیلیی، بەغیلیی. |
| مسدليات | | مێرووی باڵدار. |
| حسر | To- moult | پەڕ فڕێدان، پەڕدەرکردن لە لایەن باڵندەوە. |
| حسرم، حمرور، أبو عين، ابو منظرة | Hamrur, Bigeye, Catalufa | (کاتالوفا) چاوە گەورە، جۆرە ماسی‌یەکی قوپاوی چاو گەورەیە پەڕەکەی پشتی زۆر گەورەیە. |
| حسف، حشف | | خورمای زۆڵەك، بچووك. |
| حسق | Velvet-bur | گیایەکە گوڵەکەی سوورە. |
| حسقل، كماة | Truffle | دومەڵان، دومبەڵان. |
| حسك، سلك شائك | Barbed wire | تەلبەند، تەلی ئاسنی دڕکاویی. |
| حسك، حسكة، شوك | Thorn, spine | دڕك، ستری. |
| حسك السمك | Fish- bone | دڕکیی ماسی. |
| حسك النساج | Teasel- bur | چنگاڵی جۆلا، کەڵگێت، هەپك، شتێکی شانەدارە بۆ سفت کردنی تەون بەکاردێت. |
| حسك السنبلة | Awn, beard of corn | قەڵاسی گەنمو جۆ. |
| حسك، حسكة ، شوك | Spine, Thorn Catrops | (١) دڕك، پەیکوڵ، دڕکی سێ کوچکە، پژ، داسك. (٢) گیایەکی دەشتەکیی زەردی دڕکاوی‌یە بەرەکەی زبرە دەنووسێت بە پێستی ئاژەڵەوە، دڕکەکەی سێ پەلکی هەیە. |
| حسكي، شوكي | Thorny, Spiny | دڕکیی ، دڕکاویی. |
| حسل، زوفا، اشنان، داود، زوفي | Common-hyssop | ئەسپۆنیی داود، گیایەکە گەڵایەکی بۆنخۆشی تاڵی هەیە گوڵەکەی شینە، بۆ مەبەستی پزیشکی بۆ هەرس کردن و ورياکردنەوەو چارەکردنی کۆکە باشە. |
| حسلة | Drupe | بەری یەك دەنگی ، بەرێکی ساکارە وەکوو بەری قوخ یان گێلاس کە توێکڵێکی تەنکی هەیە لە ژێریدا کاکڵەیەکی تەڕ، ئەمیش دەوری ناوکە رەقەکەی داوە کە تەنها یەك دەنك تۆوی تیایە. |
| حسل، نبق، مسهل | Common-bucK thorn | ناوکی رەوان کەر. |
| حسم، بت | Decision | بڕیار بڕینەوە. |
| حسناء | A beauty, Beauty | ئافرەتی جوان، ئافرەتی شۆخ. |

| | | |
|---|---|---|
| حسن، جمال | Beauty | جوانیی، شۆخی، قەشەنگیی. |
| حسن یوسف | Sweet-willam | حوسنی یوسف، جۆرە گوڵێکە، جۆرێکە لە مێخەك. |
| حسن السلوك | Good-action, Good-attribute | پاك ڕەوشت، رەوشت پاكی. |
| حسنة، خال، وشم، شامة | Birth- mark, Mole | خاڵ، نیشانەیەکی زکماکی‌یە لەسەر لەش. |
| حسونة، حسون، شويكي، نقار الشوك | Gold- finch | حەوت رەنگیلە، فیڕنەگولە، فیسقەگولە، جۆرێکە لە چۆلەکە، رەنگی سوورو زەردو سپی‌و رەش‌و شین‌و خۆڵەمێشی‌و سەوزی تیایە. |
| حسيل، حسيلة | Veal | گوێرەکە، نۆبەند. |
| حسيكة، قنفذ | Hedgehog | ژووژوو، ژیژك. |
| حسيكة | BlacK- fellows | دەوەنێکی دەشتەکی‌یە تۆوەکەی دڕکاوی‌یە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| حسية، خصية الطير | Testicle-of-bird | گونیلە، گونی باڵندە. |
| حش، مولود ميت | Stillborn | لەبارچوو، بەرهاڤیی، بە مردوویێتی لەدایك بوو. |
| حش | Mowing | دروونەوە، دروونەوەی گیاو چیمەن. |
| حشائش، اعشاب | Grass, herb | گژو گیا، گیا. |
| حشائش يابسة، حشائش جافة | Hay, Dry- grass | پووش، پاوەن، ئاخڵە گیای وشکەوە بوو، گژو گیاو گەڵایەکە کەڵەکە دەکرێت لەسەر یەك بۆ زستانی ئاژەڵ. |
| حشاشة، حشاش | Last-breath | گیانەڵا، سەرەمەرگ، دواهەناسە. |
| حشاش | Hasheesh- Smoker | بەنگ کێش، تلیاك کێش. |
| حشد، تجمهر | Crowd, Gathering | رێچکە،کۆمەڵ بوون، گەلە. |
| حشد كروي | Globular-Cluster | هێشووە خڕە، کۆمەڵە خڕە، کۆمەڵێکی چڕی شێوە خڕە لە هەزارەها ئەستێرە پێك هاتووە هەر بە تەلیسکۆب دەبینرێت. |
| حشر، نخالة | Bran | کەپەك، کەپەکی ئارد. |
| حشرة، حشرات | Insect | مێروو، مەڵو موور، مێش‌و مەگەز، جڕو جانەوەر، گیاندارێکی بچوکی جومگەدارە، لەشی لە سێ بەش پێکهاتووە، سەرو سنگ‌و سك، سێ جووت پەل هەیە، هەندێکیان باڵی هەیە هەندێکی تریان بێ باڵن، بە زۆری دوو جووت باڵیان هەیە بە گەرا زاوزێ دەکەن‌و هەندێکیان سوود بەخش‌و هەندێکیان زیان بەخشن. |
| حشرة السونة | Eurygaster-maurus | سوون، سن، مێروویەکی زیان بەخشە بە دەغڵودان. |
| حشرة المن | Aphis, Aphid. Green-fly | (ئەفیس) مێشی گەزۆ، مێرووی گەزۆ، ئەسپێی رووەك، جۆرەمێروویەکی زیان بەخشە ئاوکی رووەك هەڵدەمژێت. |
| حشرة قشرية، حشرة قرمزية | Ceroplastes | مێرووی پوولەکەیی، جۆرە مێروویەکی بچووکە ئاوکیی روەکی وەکوو درەختی بەردار دەمژێت. |
| حشرة الأرضة | White-ant, Termite | تەختە کالۆس، مێرولەی سپی، مۆرانەی تەختە. |
| حشرة ثنائية الأجنحة | Diptera | مێرووی دوو باڵ، مێش‌و مەگەزی جووت باڵ. |
| حشرة كاملة، حشرة بالغة، صورة | Adult-Insect, imago | مێرووی تەواو، مێرووی پێگەیشتوو. |
| حشرة نبات | | چەمچوور، جۆرە مێشێکی گەورەیە گاز لە لقی ناسکی مێو دەگرێت‌و وشکی دەکات. |

| | | |
|---|---|---|
| حشرة التربس | Thrips | (سرپيس)، ميروويەكی سووری مەيلەو رەشی زيان بەخشە، ناوی گەلای رووەك دەمژێت. |
| حشرة مضيئة، خنفساء مضيئة، شعلة الحاصود | Glow-worm, fire-fly | گولە ئەستێرە، جۆرە قالۆنچەيەكە لە شانەكانی لەشيا مادەيەكی تيايە پێی دەوترێت (لۆسيفرين) كە ميروومكە هەناسە وەردەگرێت ئەو مادەيە دەسووتێت و بە شەو رووناكی دەداتەوە وە بەبێ گەرمیی. |
| حشرة الطلح | Ixodes | كرێنی جۆرێكە لە گەنە. |
| حشرة عقربية | | ميرووی دوو پشكيی. |
| حشرة البازلاء | Peas-insect , pase fly | كەلەسيمە، ميرووی پۆلكە. |
| حشرة القرمز | Cochineal, kermes | مەگەزە سورە، مەگەزی قرمز، ميروويەكە لەسەر داری بەڕوو دەژی. |
| حشرة الأغنام، نبر ، شعرانة، نغف | Botfly | تەنبوو، جۆرە مێشێكە لەسەر پێستی مەڕو مالآت دەژیو پێستەكەی كون دەكات پێشی دەوترێت زەردەوالە. |
| حشرة قارضة | Biting, insect, cut worm | ميرووی قرتێنەر، ميرووی كرتێنەر. |
| حشرة مجنحة | Pterygot- Insect | ميرووی بالدار. |
| حشرة المغافير | Coccidae, Mealy- bugs | شيرينی وەكوو گەزۆ يان هەنگوين دروست دەكات لە كلۆری قەدی درەختدا. |
| حشرة الحفار | Mole- cricket | ميروويەكی قاوەييە چاوی گەورەيە، قاچی وەك خاكەناز وايە بۆ هەلكەندنی قەدو لقی درەخت. |
| حشرة مائية | Aquatic-insect | ميرووی ئاويی. |
| حشرة لاثمة | Kissing bug | ميرووی ماچ كەر، ميروويەكی خوێنمژە نەخۆشی تشاجاس (شاجا) بلاو دەكاتەوە. |
| حشريات، اكلة الحشرات | Insectivorous | ميروخۆر، گياندارە ميرووخۆرەكان، وەكوو ژيشك. |
| حشر | Insertion, foisting | تێ خزان. |
| حشرجة | Rattling | پەلەقاژێ، پەل پەل، پەلە پروزێ، لرخەلرخ. |
| حشرجة الموت | Death- rattle | گياندان، كاتی كيانەلآ، كاتی گياندان، سەرەمەرگ،گيان سپاردن، كاتی گيان دەرچوون. |
| حشرج، نارجيل | Coconut, Cocotree | گوێز هيند، گوێزی هيندی. |
| حشف | | سيچكە، زۆلەك، بەرێكی بچووكی خراپ، قرپۆك، وشكەوەبوو، رزۆك، وشكەل، وەكوو لە ترێ يان لە خورمادا. |
| حشف | Exosporium | كەروويەكی زيان بەخشە، دەدات لە رووەك، وەكوو لە دارخورما. |
| حشفة | Reef | بەردی گەورە. |
| حشفة | Stubble | پەرێز، پاشماوەی لاسكی دەغلو دان دوای دروێنە. |
| حشفة، كمارة، ملتوية | Lantana | (لانتانا)، دەوەنێكی بچووكە رەنگی گەلآكەی فستقيە، گولی سپیو زەردو پەمبەيیو سووروو پرتەقاليیو شين دەگرێت بە مەبەستی پزيشكی بەكاردێت. |
| حشفة القضيب، حشفة البظر | Glans-penis, Glans Balanus | سەری كێر، كلاوەی كێر، سەری قيتكە. |
| حشو | Filling | ئاخاندن، ئاخنين، هەشاندن. |
| حشوة، حشية | Stuffing , filling wad | ئاواخن، ئاوئاخن. |
| حشوي، احشائي | Visceral | هەناويی، پەيوەندی بە هەناوەوە هەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| حشوة حريرية، تسعمل في صنع الحبر | | نەرمەلیقە. |
| حشو الأسنان | Teeth-plugging | ددان پڕکردنەوە. |
| حشية من القطن اوالصوف | Mattress | ناواخنی لۆکە یان خوری. |
| حشية من القش | Paillasse | ناواخنی کاوپووش. |
| حشيش حشيش طري | Grass, Herd | گژو گیا، گیای سەوز، هەر رووەکێکی سەوز گەڵاکەی شریتیی لە کالاندا بێت، قەدەکەی گرێدار بێت، وە گوڵەکەی وەکوو گوڵە گەنم بێت، بەرەکەی وەکوو بەری دەغڵودان بێت. |
| حشيش الفرس، ذرة حلبية | Aleppo-millet-grass | گەنمەشامیی حەڵەب. |
| حشيش سكران، حبوة البيرو | Gooseberry | تووی قاز، گیایەکە بەرەکەی سوورو ترشە دەخورێت. |
| حشيش الدريس | Hay | کا، پووش، کە بۆ ئالیك(ئالف) بەکاردێت. |
| حشيش ضار | Weed | گیای زیان بەخش. |
| حشيش جاف، حشيش يابس | Hay | پووش، پەڵاش. |
| حشيشةالملوك، حشيشة الشفاء | Common-tansy , aralia | شاگیا، گیایەکی پزیشکییە، گوڵی زەردی هەیە، رووەکێکی بۆنخۆشە. |
| حشيشة البراغيث، بزر قطوناء | Flea-wort | گیا کێچ، گیایەکی دەشتەکیی و پزیشکیە مادەیەکی لینج لە گەڵاو گوڵ و تۆوەکەی دەردەهێنرێت بۆ دەرمان و پیشەسازی. |
| حشيشة التنين | Dragons-wort | گیا ئەژدیها، رووەکێکی سەلك دارە بە تۆ و سەلك زیاد دەکرێت. |
| حشيشة الثوم الباريا | Garlic-wort | گیاسیر، گیایەکە، گەڵاکەی بۆنی سیری لێدێت، گوڵەکەی سپییە تۆوەکەی وردە. |
| حشيشة البساط، مغيرة | Mollugo | (مۆلەگۆ)، گیایەکی دەشتەکییە بۆ لەوەڕ باشە. |
| حشيشة الأوجاع | Holy-herb, vervain | مینا، گیایەکی بۆنخۆشی پزیشکییە گوڵی پەمبەیی هەیە. |
| حشيشة الطحال | Spleen-wort | قەیتەران، گیا سپل، بۆ نەخۆشی گورچیلە باشە. |
| حشيشة الأبرة، ابرة العجوز | PicK- needdle | دەرزیلۆکە، گیایەکە بەرەکەی وەکوو دەنووکی هەبێت وایە. |
| حشيشةالكيف، حشيشة، قنب الهند | Hashish, Indian- hemp | بەنگ، چەرز، گوشی هیندیی، حەشیشە، رووەکێکی ساڵانەیە، لە قەدەکەی دەرمانی وریاکردنەوەو سڕکەر دەردەهێنرێت وە هەندێ کەس دەیکێشێت. |
| حشيشة الجرح، حشيشة الدب | Kidney-vetch, wound-wort | گیاورچ، گیایەکی پزیشکییە گوڵەکەی پەمبەیە بۆ لەوەڕیش باشە. |
| حشيشة الجاموس | Buffalo- grass | گیاگامێشە، گیایەکی لەوەڕە. |
| حشيشة الحليب | Red-bird-Cactus, Slipper-flower | گیاشیر، دەوەنێکە گوڵەکەی سوورە شیراوێکی لینجیی سووتێنەری لێ دەردەهێنرێت بۆ دروستکردنی دەرمان بەکاردێت. |
| حشيشة رامي، حشيشة الصين | China-grass, ramie | (رامی) گیاچینیی، رووەکێکە لە چین و یابان دەڕوێنرێت ریشاڵی قایمی لێ دەردەهێنرێت بۆ دروستکردنی بەڕە. |
| حشيشة الملائكة، حشيشة الملاك | Angelica-officinalis | گیا فریشتە، رووەکێکە لە دروستکردنیی مەیی ئەلکهولییدا بەکار دەهێنرێت و بۆنی خۆشە لە قەراغ رووبارو گۆمەکاندا دەڕوێت، گەڵاکەی گەورەو ددانەدارە گوڵەکەی سپیی مەیلەو زەرد یان سەوزە، بۆنی هەنگوینی لێ دێت، قەدەکەی شین یان سوورە. |
| حشيشة الدهن | Butter-wort | گیای رۆن، گیایەکی پزیشکییە رەنگێکی زەردی لێ دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| حشيشة البركة | Marsh-grass | گیای زەلکاو، گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵودانە. |
| حشيشة الشعير | Barley-grass | گیاجۆ، گیایەکە لە جۆ دەچێت. |
| حشيشة الدينار، جنجل | Common-hop | مارچێوە، رووەکێکی خۆهەڵواسەرە نزیکی (١٠) مەتر بەرز دەبێتەوە، گوڵەکانی شێوەیەکی هێلکەیی و زبرو پارچە پارچەیان هەیە، گوڵەکانی تاك رەگەزن، دەکرێنە بیرەوە بۆ ئەوەی تاڵ و بۆنخۆشی بکەن. |
| حشيشة المحمودة، سقمونيا | Scammony-plant | گیای سکامۆنیی، گیای سەقمۆنیا. |
| حشيشة الملكة، اهلال قسطا | tansy, Cost, Costmary | (تانسی) ، گیای شاژن، گیایەکی تەمەن درێژی هەمیشە سەوزە، لقەکانی قیتن، گەڵاکانی بۆنخۆشن، گوڵەکانی بەشێوەی هێشوویەکی بچووکی زەردن،دەکرێتە خواردنەوەو دەرمانی لێ دەردەهێنرێت بۆ نەخۆشی مێشك،و ئاوبەندو کرم فرێدان و باداریی. |
| حشيشة السلحفاة | Golden-tuft, alyssum | گیا کیسەڵ، گیایەکی پزیشکییە گوڵێکی بچووکی هەمەرەنگەی بۆنخۆشی هەیەو گەلێك جۆری هەیە. |
| حشيشة الأفعى، اخيون | Vipers, buglos, SnaKe-flower, goose-grass, Cleaver, cliver | گیا مارانە، سەرمەمار، گیایەکی پزیشکییە، گوڵی شین و بنەوشەیی هەیە. |
| حشيشة النجم،أنجم لامع، حشيشة الاغ | Aletris, star-grass | گیا ئەستێرە، رووەکێکی پزیشکییە رەگەکەی بۆ بەهێزکردن و کرم فرێدان بەکار دەهێنرێت. |
| حشيشة الاسنان، رصاصية | Lead-wort, tooth-wort | گیای ددان، گیای خۆڵەمێش،گیایەکی دەشتەکیی پزیشکییە، گوڵەکەی رەنگی خۆڵەمێشی هەیە. |
| حشيشة الحجل، عرار | Fritillary | گیا سوێسکە، گیایەکە لە کۆمەڵەی زەمەق گوڵەکەی لە زەنگوڵە دەچێت ئاوگەکەی تفت و رەوانکەرە. |
| حشيشة الذباب | Dwarf-catchfly | گیامێش، گیامێش گرە، گیایەکە لە کۆمەڵەی مێخەك گوڵەکەی سوورە. |
| حشيشة العقرب، قبس ازرق | Charity, greek- valerian, Heliotrope turnsole | گیا دووپشکە، ئاپەکەرەڵە، ئاڵەمارانە، تاڵوو، جۆرە گیایەکی تاڵی ژەهرە سەری چڵەکانی تۆوی پێوەیە، وەك کلکی دووپشك گرێ گرێیەو هەڵگەراوەو سەوزە، لە نزیك ئاو لەناو بەردەڵانیدا بە زۆری سەوز دەبێت، دژی پێوەدانی دووپشك بەکاردەهێنرێت، بە سەوزی دەکوترێ و دەخرێتە سەر شوێنی پێوەدانی دووپشکەکە. |
| حشيشة الرمال | Marram- grass, mat-weed | گیالم، رووەکێکە لە کۆمەڵەی دەغڵودان لە زەویی لمانیدا دەچێنرێت بۆ ئەوەی جێگیری بکات. |
| حشيشة الرئة | Lung-wort | گیاسی، گیایەکە گوڵی هەمەجۆری هەیە، رەگەکەی ریشاڵاوییە، گەڵاکەی لەشێوەی تیغدایە توکنە. |
| حشيشة السعال، فرفارة | Cough-wort | گیاکۆکە، گیایەکە گەڵاکەی وەکوو رەگ وایە، گوڵەکەی زەردە، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت، قەدی نیە، گەڵاکانی یەکسەر لە زەوییەوە دەردەچن، بە قەدەر لەپی دەست دەبن. |
| حشيشة الخطاف، عشبة البواسير | Pile-wort, Ficary | گیا پەرەسێلکە، گیامەیاسیریی، گیایەکە لە شوێنی سێبەرو نسردا دەروێت، گەڵاکەی لە لەپی دەست دەچێت، گوڵەکەی زەردە رەگەکەی کورت و ئەستوورە ئاوگەکەی دژی نەخۆشیی مەیاسیریی بەکاردێت. |
| حشيشة الربيع، نجيل العطر | Spring-grass, Sweet- vernal- grass | گیابەهارە، گیایەکی دەشتەکییە گوڵەکەی قستقیە رەنگێکی زەردی لێ دەردەهێنرێ. |

| | | |
|---|---|---|
| حشيشة البرص، حشيشة البهق | Small-honey-wort | (چێرڤیل)، گیا بەڵـەكیی، ڕووەكێكـە گوڵەكـەی سـپییە بەرەكـەی وردەو ڕەشەو بۆنخۆشە بۆ مەبەستی چارەكردنی نەخۆشیی پێست بەكاردێت. |
| حشيشة السرة، امفلود | Navel-wort, Omphalodes | گیا نـاوك، گیایـەكی دەشـتەكیە گـەڵێك جـۆری هەیـە گوڵەكـەی بەشـێوەی هێشوویەكی شینە. |
| حشيشة الكلب، فراسيون ابيض | White-horehound | گیاسەگ، گیایەكە لە قەراغی ڕێگاوباندا دەڕوێت، لاسكەكەی مووی سپی پێوەیە، گوڵەكەی سپیو مەیلەو بۆرە، بۆنێكی تیژی هەیە، تامێكی تاڵو تفتو توونی هەیە، دەرمانی كۆڵنجو كۆكەی لێ دەردەهێنرێت. |
| حشيشة العقاب | | چاوبازە، گیایەكی دڕكاویە، گوڵەكەی ئاوێتەو توكنو درێژە، قەراغەكەی گرنج گرنجە، لەگوڵە جۆ دەچێت، دژی ڕەوانی بەكاردێت. |
| حشيشة البغل، بسباج | Hemionitis, Mule- wort | گیا ئیستر، جۆرێكە لە كەرەوزی كێویلە. |
| حشيشة القطة، ناردين مخزني | Valerian | (ڤالیریـان)، ، نـاردین، گیـا پشـیلە، گیایەكـە گوڵەكـەی بچـووكو پەمبەیـە ڕەنگەكـەی دەرمـانی لـێ دەردەهێـنرێت بـۆ بـەهێزكردنی دەمـارو جگـەرو گورچیلەو هێزی ڕەگەزی جگە لە دروستكردنی عەتر. |
| حشيشة الداحس، حريط | Paronicha, whitlow-wort | گیا مێخەكـە، گیایـەكی پزیشـكییە لـە كۆمەڵـەی مێخـەك بـۆ چـارەكردنی مێخەكەی پەنجە بەكاردێت. |
| حشيشة السمك، نيلوفر ابيض | White-water-lily | لیلوپەڕی ئاویی سپیی، گیا ماسیی. |
| حشيشة الأسد، هالوك | Dodder | گیاكەڵە، گورگە، ڕوەكێكیی مشەخۆرە ڕەگەكەی لە ڕەگی درەختی ترەوە دەئاڵێنێتو خۆراكی لێ وەردەگرێت. |
| حشيشة الرمد | Euphrasia-officinalis | گیا چاوئێشە، گیایەكـە لـە قـەراغ ڕێگاوبـاندا دەڕوێـت گوڵەكـەی سـپیو مەیلەو شینە بۆ چاوئێشە بەكاردێت. |
| حشيشة الدب | Wound-wort, Kidney-vetch | گیا ورچ،گیا برین، گیایەكە گوڵێكی زەردی ئاڵتوونی دەگرێت. |
| حشيشة الجرب | Scabiosa | (سكابێوزا)، گیاگەڕی، گیایەكە بۆ چارەكردنی نەخۆشی گەڕیی بەكاردێت. |
| حشيشة الغراب | HawK weed, HawKs-eye | گیاقەلە، چاوی باز، گیایەكی دەشتەكی‌یە قەدو گەڵاكەی تووكنە، گوڵەكەی زەردە ڕەگەكەی بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| حشيشة الضفدع | Buffonia | (بوفونیا)، گیابۆق گیایەكی دەشتەكی‌یە لە كۆمەڵەی مێخەك. |
| حشيشة الأوز | Rough-cingvefoil | گیاقاز، گیایـەكی دەشتەكی خشـۆكە گەڵاكـەی توكنـە گوڵەكـەی زەردە بـۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| جشيشة اللبن، بولوغالن | MilK-wort | گیاشیر، ڕووەكێكە قەدەكانی باریكن، بەشێوەی چـەپك، گەڵاكـەی درێـژو باریكە، گوڵەكەی وەكوو گوڵەگەنم وایە بۆ لەوەڕ باشە شیر دەدات بە ئاژەڵ. |
| حشيشة الريح، مسك الجن | Hul-wort, cat-thyme | گیاجنۆكە، گیابا، گیایەكی پزیشكی‌یە گوڵەكەی زەردە. |
| حشيشة الكرعان، حشيشة القرعان | Peach-wort, Bog-rhubarb, ladys thumb | ڕێواســی زەلكـاو، گیایـەكی دەشـتەكی‌یە پزیشـكیی بۆگەنـە، گوڵەكـەی سوورە. |
| حشيشة القمر | Lunaria | (لوناریـا)، گیـا مـانگ، گیایـەكی دەشـتەكیە گوڵەكـەی گەورەیـە شـین یـان بنەوشەییە. |
| حشيشة القزاز | Common chicKweed, star weed | گیـای بـاڵندە، گیایەكـە گوڵەكــەی سـپیو ئەسـتێرەیی‌یە، بـاڵندە گـەڵاو دەنكەكەی دەخوات. |
| حشيشة القمل | Louse-wort | گیا ئەسپی، گیایەكە گوڵی سپی یان پەمبەیی دەگرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| حشيشة القنفذ | Hedgehog-wort | گیاژیژك، گیاژیشك، دەوەنێکی دەشتەکی‌یە دڕکی زۆرە. |
| حشيشة الجبن | Cheese-weed | گیاپەنیرە، بەندك. |
| حشيشة مباركة | Herb-bennet, Avens, wood-avens, Cloe-wort, Throat wort, Cloveroot | گیا پیرۆزە، گیایەکە قەدو گەڵاکەی تووکنە. |
| حشيشة الليمون | Lemon-grass | گیالیمۆ، گیایەکی دەشتەکی‌یە لە کۆمەڵەی دەغڵودانە بۆنەکەی لە بۆنی لیمۆ دەچێت وەکوو چایی بەکاردێت. |
| حشيشة الخنازير | Water-betony | گیابەراز، گیایەکە گوڵەکەی بەشێوەی هێشووی سوورە. |
| حشيشة الملاعق | Spoon-wort | گیاکەوچك، گیایەکی پزیشکی‌یە گەڵاکەی لە کەوچك دەچێت گوڵەکەی سپی‌یە گەڵاکەی توونە. |
| حشيشة الحمى، غرديب | Faver-few | گیاتا، گیایەکە لە بەیبوون دەچێت بۆ چارەکردنی تا بەکاردێت. |
| حشيشة النحل، ترنجان | Lemon-balm | گیا هەنگ، ترنج، گیایەکە گوڵەکەی سپییە هەنگی تێ دەورووکێت، گەڵاو گوڵەکەی بۆنخۆشە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| حشيشة النزف | Aspilia | (ئەسپیلیا)، گیایەکی دەشتەکی‌یە بۆ خوێن وەستاندن بەکاردێت. |
| حشيشة الوحل | Mud-wort | گیای قوڕ، گیایەکە لە زەلکاودا دەڕوێت گوڵی سپی یان پەمبەیی دەگرێت. |
| حشيشة البحر اشنة | Lichen | قەوزە، کەڤر. |
| حشيشة اسبارتو، حلفة، حلفاء | Esparto-grass, Halfa | زەل، گیایەکە سەبەتەو پەتو کاغەزی لێ دروست دەکرێت. |
| حشيشة الفضة، قموليا | Alchemillia, ladys mantle | گیازیو. |
| حشيشة الصليب | Cross-wort | گیاخاچ، گیایەکە بۆنی لە بۆنی سیر دەچێت. |
| حشيشة الزوفي، حشيشةالزوفا، اشنان داود،حسل | Hy ssop | راجع (حسل زوفا). |
| حشيشة ابي دقيق | Butterfly wort | گیا پەپوولە، گیایەکی جوانە گوڵی پرتەقاڵیی دەگرێت، پەپوولە دەهێنێت بۆ لای خۆی. |
| حشيشة الجميل، كارفة | Hair-bell | گیا جوانە، رووەکێکی سەلکدارە لە کۆمەڵەی زەمق گوڵی سپیی یان سوور یان زەرد دەگرێت. |
| حشيشة البزاز | Nipple-wort | گیا گۆ (لە گۆی مەمکەوە) گیا مەمك، گیایەکی دەشتەکی‌یە گوڵەکەی زەردە. |
| حشيشة المكنسة | Calona, Kalona | (کالۆنا) گیا کەسکە، دەوەنێکی کورتی هەمیشە سەوزە، گەڵاکەی دەرزیلەییە، گوڵەکەی سپی یان پەمبەیی یان زەردە لەشێوەی زەنگوڵەدا. |
| حشيش برمودا، حشيش الثيل | Bermuda-grass Dogs-Tooth | گیای بیرموٚدا، چیمەن، هەرێز، فریز، گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵودان بۆ مەبەستی پزیشکی و رازاندنەوەی گۆڕەپانی (ساحە) باخچەکان بەکاردێت. |
| حشيشة الزجاج | licK-wort | گیا شووشە، گیایەکیی دەشتەکیی پزیشکی‌یە شووشەی پێ پاك دەکرێتەوە. |
| حشيشة الذهب | Golden-herd, scaly-spleen-wort, Everlasting-Flower | گیا زێڕ، گیایەکە گوڵێکی جوانی هەیە، وشك دەکرێتەوەو هەڵدەگیرێت بۆ زستان. |
| حشيشة الزئبق | Mercury- wort | گیا جیوە، گیایەکی پزیشکی‌یە بۆ میزپێکردن باشە. |
| حشيشة الكلب | Whitehore-hound | قەتینە، گیاسەگ. |

| | | |
|---|---|---|
| حشيشة العلق اناغاليس | Anagallis | گیازەروو. |
| حص،حبة | Slice | کوون، قاش. |
| حص، ورس | Saffron | زەعفەران، ڕووەکێکە ڕەنگی پێ دەکرێت. |
| حصاد باليد | Reaping with hands | دەسکەنە، دروێنەی دەست، پاکودان. |
| حصاد، حصيد ، جزاز | Harvest | دروێنە،درەوکردن، دووریینەوە، پاکۆدان، درەو. |
| حصاد، حاصد | Mower, Reaper | دروێنەکەر، سەپان، پالە. |
| حصادة، دراسة | Reaperand threshing-machine | مەکینەی دروێنەو گێرە. |
| حصادة، محصدة | Reaping-machine | مەکینەی دروێنە. |
| حصاالبان، حصا لبان، اكليل الجبل، حصلبان | | ڕۆزمـاری، ئاسـاییی، گوڵبـەندی شـاخیی، شـەونمی دەریـا، دەوەنێکـی بۆنخۆشی پزیشکی هەمیشە سەوزە، گوڵەکەی شینە بەشـێوەی بـەهارات بەکاردێت و بۆنێکی خۆش لە گەڵاو گوڵەکەی دەردەهێنرێت. |
| حصاة، حصوة، حصباء، حصب | Small-stone, gravel, peddle, calculus | چەو، زیخ، بەردی بچووک، شیشە بەرک. |
| حصاة الكلية، حصاة بولية | Renal-Calculus, urinary-calculus urolite | بەردی گورچیلە، بەهۆی ئاوسانی گورچیلەو مانەوەی میز لە گورچیلەدا لە ئەنجامی گیرانی بۆڕیی میزەوە پەیدا دەبێت. |
| حصاة المثانة | Bladder- stone, bladder-gravel Cystolith | بەردی میزڵدان، بەردێکە لە میزڵداندا پەیدا دەبێت، یا لە گورچیلەوە بە بۆڕی میزدا دەخزێتە میزڵدانەوە یان بە هۆی گیرانی بۆڕیی میزەوە پەیدا دەبێت. |
| حصاة الحالب | Ureterolith | بەردی دۆشەری میز. |
| حصاة المرارة، حصاة صفراوية | Gall-stone chololith | بەردی زراو، بریتییە لە چەند بەردێك کە لە چەوریی کۆلیسترۆل لە زراودا پەیدا دەبێت . |
| حصان | Horse, stallion | ئەسپ، هەسپ، ڕەخش، وەکوو ئەسپی جعێتێ. |
| حصان ابليس فرس النبي، أبو صلاح، سرعوفة | Mantis, praying-insect, Soothsayer | ئەسپی پێغەمبەر، کوللە حاجیی، جۆرە کوللەیەکی سەوزی دڕندەیە مێروو دەخوات. |
| حصان العربة | Carriage- horse | ئەسپی عەرەبانە، ئەسپی ڕاکێشان، بارگیر. |
| حصان قصير | Cob | کۆب، ئەسپێکی بەهێزی لاق کورتە. |
| حصان برزوالسكي | PrzewalsKi | ئەسپێکی دەشتەکییە لە مەنگۆلیا دەژی. |
| حصان النزو | Stallion | ئەسپی پەڕین، ماین بەران، ئەسپێك کە تەنها بۆ پەڕین تەرخان کرابێت. |
| حصان اصيل | Pedigree-horse, Blood-horse | ئەسپی ڕەسەن. |
| حصان وحشي | Wild- horse | ئەسپی کێویی، ئەسپە کێویی. |
| حصان السباق | Race-horse | ئەسپی ڕەیسز، ئەسپی گرەو، ئەسپی غارغارێن. |
| حصان الوثب، وهان خشبي | | ئەسپە چێوینە، ئەسپیە دارینە، بۆ یاری بازدان. |
| حصان الحمل، برذون | PacK-horse | یابوو، بارگیر، ئاختە، یەختە. |
| حصان الجر، كديش | Draft-horse | ئەسپی ڕاکێشان. |
| حصان الركوب، جواج | Saddle-horse steed | ئەسپی سواریی. |
| حصان أول | Eohippus | یەکەم ئەسپ، ئەو ئەسپەیە کە لە سەردەمی ئیوسینیدا ژیاوە واتە (٥٠) ملیۆن ساڵ لەمەبەر. |

| | | |
|---|---|---|
| حصان البحر | Sea-horse, Hippocamp | ئەسپی دەریا، جۆرە ماسی‌یەکی دەریایی بچووکە لە ئەسپ دەچێت، نێرەکانیان توورەکەیەکیان هەیە بەسەر سکیانەوە، هێلکەکانیان تیا هەڵ دەهێنن. |
| حصان بخاري | Horse-power | (هێزی ئەسپ)، یەکە یەکە بۆ قەبلاندنی هێزی مەکینە بریتی‌یە لەو هێزەی کە پێویستە بۆ بەرزکردنەوەی قورسایی (٧٥) کیلۆ بۆ ماوەی یەك مەتر لە چرکەیەکدا. |
| حصاف، بلاكرا | Pellagra | سەودا، سەودایی، نەخۆشی‌یەکی پێستە لە کەمی فیتامین B یەوە پەیدا دەبێت، بێ‌هێزی دەمارو هەرسکردنی لە گەڵدایە. |
| حصار | Siege, BlocKade | شوورە، پەرژین، تەنان، تەیمان. |
| حصار، محاصرة | Blockading | ئابڵوقەدان، بەگیرهێنان، دەوردان. |
| حصانة، مناعة | Immunity | بەرگری، بەرهەڵستی لەبەشی زیندەوەر، دژی نەخۆشیی، دوو جۆرە بەرگریی سروشتیی و بەرگری دەستکرد. |
| حصبة | Measles | سوورێژە، سۆرێکە، سوورکە. |
| حصبة المانية، حميراء | Rubella, Rubeola, German, measles | سوورێژەی ئەڵمانی، دڕکە، نەخۆشی‌یەکی درمە لە سورێژە دەچێت، پەڵەی پەمەیی، لەسەر پێست پەیدا دەکات، وە لوەکانی مل دەئاوسێنێ. |
| حصبة كاذبة | Rubeola-notha | سوورێژە درۆزنە. |
| حصباء، حصب | Gravel, pebble | زیخ، چەو، خیز، خیچك. |
| حصبة الخنزير، حمرة الخنزير | Measles | سوورێژەی بەراز، نەخۆشی‌یەکیی میکرۆبی‌یە تووشی بەراز دەبێت، پەڵەی سوور لەسەر گوێچکەو سنگ و سکی پەیدا دەکات. |
| حصبة سوداء | BlacK-measles rubeola-nigra | سوورێژە، رەشە. |
| حصة دراسية | Period | ماوەی خوێندن، وانە. |
| حصة | Share portion | بەش، بەرکەوت، بەهر، پشك. |
| حصة الأسد | The-lions share | بەشی شێر، زۆربەی بەش. |
| حصد،حصاد | Reaping-Harvesting | درەو، دروێنە، سەپانیی پاڵەیی. |
| حصر | Besieging, Blockading, surrounding | تێ ترنجان، دەورەدان، قەتیس کردن، گەمارۆدان، تەنگاوکردن، پەنگ خواردنەوە، گلدانەوە. |
| حصر، احتكار، حكر | Monopoly | (مۆنۆپۆلی)، ئوەیە کە نرخدان و فرۆشتنی شتوومەك تەنها لە لایەن یەك کەس یان یەك کۆمەڵەوە بکرێت. |
| حصر، قبوضية | Coprostasis | قەبزی، گوو نەکردن. |
| حصرم | Verjuice | بەرسیلە، بەسیرە، قۆڕن، هاڵەترێ، قۆڕە، ژۆر،هالە. |
| حصص الشعر | Baldness | وەرینی قژ، قژوەرین، قژ رووتانەوە تووڵەکیی. |
| حصف، حمو النيل | Prickly-heat | گەرمەژنە، گرمژنە، گەرمەژەن، گەرمژە، گەرمەژۆ. |
| حصف الحر | Dry- itch, Impetigo | وشکە خوروو، شەرا، گرە، نەخۆشییەکی پێستە. |
| حصلبة، جيولوجيا | Geology | (جیۆلۆجی)، زانیاریی زەوی. |
| حصلمة | Pedology | (پێدۆلۆجیی)، زانیاریی گڵ و خۆڵ دەربارەی پێکهاتن و چۆنێتیی بەکارهێنانەوە. |
| حصن | Fort, strong-hold | قەڵا، قولله، سەنگەر، قەڵات، بورج. |
| حصو، حصي | Gravel, pebble | چەو، زیخ، خیز، خیچك. |
| حصول، حدوث | Happening, Occurrence | روودان، پەیدابوون. |

| | | |
|---|---|---|
| حصوة خشنة | Roughpebble | چەوی زبر، زیخی زبر، چەوی درشت. |
| حصوة ناعمة | Smoothpebble | زیخی نەرم، وردە زیخ. |
| حصير | Mat | حەسیر، حەسیل. |
| حصيرة الشباك | Jalousie | حەسیری پەنجەرە. |
| حصيد، حصاد | Harvest | دروێنە، درەو. |
| حصي لبان بري، حصالبان المستنقع، اكليل الجبل البري | Marsh-rosemary | واتا گوڵبەندی شاخی، رۆزماری دەشتەکیی، رۆزماری زەلکاو، جۆرە رووەکێکی ژەهرینە، جیاوازە لەگەڵ رۆزماریی. |
| حصية | Concretion | تۆپەڵێکە لە مادەیەکی کانزاییی بەشێوەیەکی خڕ یان خەپلەیی لە ناو بەرددا. |
| حصيلة | Yield, clear-product | پوختەی دەسکەوت. |
| حصيمة | Tubercle | سەلکۆکە، وەکوو سەلکی نێرگزو سیر. |
| حصين | Strong | قایم، مەحکەم. |
| حضانة، تربية | Nursing | دایەنکاریی، بەخێوکردن، پەروەردەکردن. |
| حضانة الجراثيم | Incubation | ئەشەمیکرۆب، گەشەمیکرۆب، ئەشونمای میکرۆب لە لەشی زیندەوەردا، بۆ لەشی گیاندار هەتا وەکوو نیشانەکانی نەخۆشییەکە دەردەکەوێت. |
| حصانة البيض | Incubation | کڕکەوتی باڵندە لەسەر هێلکە |
| حضانة | Incubator | . مەکینەی جووجوڵە، مەکینەی هێلکە هەڵهێنان. |
| حضار | A-centauri | ئەستێرەیەکی گەڕۆکە، لە بورجی سینتاورەس. |
| حضارة | Civilization | شارستانێتیی، ئاوەدانێتیی، ژیار، ژیوار، ژیاریی. |
| حضال | Loranthus | (لۆرانسەس) رووەکێکی مشەخۆری هەمیشە سەوزە لە کۆمەڵەی دەموکانە، لەسەر درەختی بەردار دەژی، مادەیەکی رینسینی لێ دەردەهێنرێت هەروەها بۆ مەبەستی پزیشکیش بەکاردێت. |
| حضب | He- Snake | نێرەمار، ئاشقە. |
| حضر | | کەڵەکەبەرد، کەڵەکەدار، کەڵەکە. |
| حضر، حضرا | Gallop | تاودان، تاو، ژاوی غارکردن، پرتاو. |
| حضر | Urbanity | شار، دیماتی ئەوانەی کە کۆچ ناکەن. |
| حضض، عرقد، أطد | Box- thorn , dwarf-buck- thorn, Caffir-thorn | دڕکی دێو، چالووك، کونار، دەوەنێکەگوڵەکەی بنەوشەیی یان سوور یان زەرد یان سپییە، لقەکانی دڕکاوییە بۆ پەرژین باشە، بەرێکی سووری هەیە لە ترێ دەچێت. |
| حضن، حضن | Bosom, embrace | باوەش،کۆش، هامێز، ئامێز. |
| حضن، حضانة، ترخيم | Incubation | ئەشەی بێچوو، گەورەبوونی بێچوولەی ناو هێلکە بەشێوەیەکی سروشتی یان دەستکرد. |
| حضنة | Nest- of eggs Brood-covey | هێلانەی پڕ لە هێلکە. |
| حضور | Presence | هاتن، گەیشتن، ئامادەبوون. |
| حضون | Broodyhen | بەکڕ، مریشکەبەکڕ. |
| حضيض | Lowland, perigee | زەوی نزم، نشێو، نشیڤیی. |
| حضيرة، كتيبة | Detachment | دەستە، پەل، دەستەیەك کەشتی. |

| | | |
|---|---|---|
| حوتيات | Catacea | کۆمەڵەی نەهەنگەکان وەکوو نەهەنگی سپێرم و بالینا. |
| حوت سليمان، سمك سليمان | Salmon | (سالمۆن)، یاقوو، نەهەنگی سلێمان، جۆرێکە لە ماسیی. |
| حوت العنبر | Sperm- whale | نەهەنگی عەمبەر، جۆرێکە لە نەهەنگ نزیکەی (٢٠) مەتر درێژ دەبێت، مادەی عەمبەر لە ریخۆڵەی دەردەدات بۆ دروستکردنی عەتر سوودی لێ وەردەگیرێت. |
| حوت القاطوس، حوت القيطس، هركول | Rorqual, Balenoptera | نەهەنگی کیتۆس، نەهەنگێکە سەر پشتی پەرەکەیەکی گەورەی پێوەیە، ناوەکەی لە وشەی (کیتۆس) لاتینییەوە وەرگیراوە. |
| حوت ازرق | Blue-whale | نەهەنگی شین، گەورەترین جۆرە لە نەهەنگ، درێژییەکەی نزیکەی (١٠٠) پێ و کێشەکەی لە (١٥٠) تەن دەبێت. |
| حوت البال، حوت البالين | Balena, Balaena Whale-bone | (بالین)، نەهەنگی بێ ددان، جۆرێکە لە نەهەنگ سەری زلە، ددانی نییە، بەڵام لە جیاتی ددان جۆرە شانەیەکی رەق نووساوە بە مەلاشوویەوە بۆ هاڕینی خواردەمەنیی، رۆنی نەهەنگیی لێ دەردەهێنرێت. |
| حوت وحيد القرن، كركدن البحر، نروال | Narwhal, Narwal, sea-unicorn | (ناروال)، کەرکەدەنی دەریا، نەهەنگی یەک شاخ، جۆرێکە لە نەهەنگ، یەکێك لە ددانەکانی بوە، بە کەڵبەیەکی درێژ لە دەمیەوە هاتۆتە دەرێ، درێژیی ئەم نەهەنگە (٣) مەتر دەبێت لە ناوچەی بەستەڵەکی باکووریدا دەژی. |
| حوت حيمني، حوت المني | Sperm-whale | نەهەنگی سپێرم، جۆرە نەهەنگێکە رۆنێکی تایبەتیی لە سەرەکەی دەردەهێنرێت، هەروەها مادەی عەمبەر (عنبر) لە گەدەکەی دەردێت کە ئەمیش بۆ دروستکردنی عەتر بەکاردێت. |
| حوت قتال، حوت قاتل | Orcinus | (ئۆرسینەس)، نەهەنگی بکوژ، نەهەنگی کوشندە، جۆرە نەهەنگێکی درەندەیە ددانی تیژی هەیە لە کەڵبە دەچێت، هێرش دەباتە سەر نەهەنگەکانی ترو پارچە پارچەیان دەکات. |
| حوت الجن، قوبيون | Goby, MudsKippers | (گۆبی)، ماسییەکی دەریایی و رووبارییە پەرەکەکەی درکاوییە. |
| حوت أحدب، جمل البحر، كبع | Hump-back-whale | نەهەنگی کووپ، نەهەنگی قەموور، وشتری دەریا، نەهەنگێکە پەرەکەکەی پشتی لە دووگی وشتر دەچێت. |
| حوت جنوبي | Southern-fish | نەهەنگی باشووری، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشوورییە. |
| حوثاء، كبد | Liver | جگەر، جەرگ. |
| حوجمة، حوجنة | Red-rose | گوڵەباخی سوور. |
| حودل، ميمون، رباح، قردح، فردوح | Baboon, Mangabey | (مانجابی)، (بابوون)، مەیموونێکی بچووکیی کلك درێژە. |
| حودلة، اكمة، ايكة | Grove | مێشەڵان، جەنگەڵ. |
| حوذان،شقائق، النعمان، لالة، ماميران، زرذهبي | Butter-cup, Crowfoot, Turban | جونگ، چونگ، گوڵە بەهارە، کڵاوەسوورە، گوڵەکەزار، جۆرە گیایەکە گوڵێکی زەردی بۆن خۆش دەگرێت. |
| حوذي، سائق العربة | Driver, Cabman | عەرەبانچی، گالیسکەچی. |
| حورية، حوراء | Nympha, Nymph | پێ کورە، پاکورە، بێچووی کوللە. |
| حورية البحر | Mermaid, sea-woman | (مێرمێد)،بووکی دەریا، گیاندارێکی خەرافیی دەریاییە گوایە لەشی لە لەشی ئافرەت و کلکی لە کلکی ماسیی دەچێت. |
| حورية الجرادة | Locust-nymph | پێ کورەی کوللە، پاکورەی کوللە. |
| عذراء، حوراء | Hopper | بێچووی کوللە. |

| | | |
|---|---|---|
| حورية الماء | Naiad | ئاو رۆشن کەرەوە، مێرووییەکی ئاویی بچووکە، لەسەر رووی ئاو خێرا خێرا دەجولێتەوە. |
| حور الفرات، غرب، مرسيس | Euphratica-poplar, willow | پاڵت، داربیی، بیهۆك، پەڵك. |
| حور اسود، حور رومي | Nigra-poplar-Black-poplar | رەشەچنار، درەختێکە بەرەکەی قووچەکییە، توێکڵەکەی مادەی رەنگی لێ دەردەهێنرێت. |
| حور ابيض، قوغ | Abele-tree White-poplar, abelia | سپیی چنار، درەختێکە قەدو لقەکەی سپییە گەڵاکەی هێلکەییە سوود لە قەدەکەی وەردەگیرێت بۆ دارەڕای سەربانی خانوو. |
| حور، حور، دلب | Aspen, Asp, poplar, Alder | چنار، سپیندار، شۆخ، سپی دار، پەڵك، ئەسپەندار، درەختێکی گەورەیە لاسکی گەڵاکانی درێژە بە قەڵەم زۆر دەکرێت بەرەکەی وەك قوتوویەکی بچووك وایە، تۆوەکەی مادەیەکی ئاوریشمی پێوەیە، تەختەکەی سپییەو سوودی لێ وەردەگیرێت بۆ دروست کردنی کەلوپەلی ناو ماڵو سووتەمەنیو دروست کردنی کاغەزو شقارتەو تەختەی موعاکەس. |
| حوران | Skin of elephant | پێستی فیل. |
| حوشب، ثنة | Fetlock-Joint | چوکڵەیەکە تووکی پێوەیە گەرتۆتە دیوی پشتەوەی لاقی وڵاخ لە سەرووی سمەکەیەوە. |
| حوصلة، كيس، مثانة | Cyst | توورەکە، میزڵدان. |
| حوصلة، ذروة | Crop, craw | سیکڵدانۆچکە، چیکڵانە، چیکڵدانەی مەل، چیقڵدان، سیکڵدانە، چیکڵدانە، توورەکۆکە، بەشێکە لە کۆئەندامی هەرس لە باڵندەدا تۆوی رووەکی تیا کۆدەبێتەوە بۆ خووساندن بەر لە هەرس کردنیان. |
| حوصل، بجع | Pelican | سەقاقوش، باڵندەیەکی ئاویی گەورەیە توورەکەیەکی هەیە لەژێر ملیدا ماسیو گیانداری ئاوی تیا کۆدەکاتەوە پێش ئەوەی بیانخوات. |
| حوض | Basin | حەوز، ئاوگێڕ، قوتەر، کۆتەڵ، رفکە، ئەستێل، چاڵاو، ئەستێرك. |
| حوض السمك | Fish-pond | حەوزی ماسیی، حەوزی پەروەردەکردنی ماسیی. |
| حوض التشطيف، حوض الأغتسال | Wash-basin | حەوزی شتن. |
| حوض لحمل الطين | Hod | تاسە. |
| حوض السفن | Dock | حەوزی کەشتیی، ئەو شوێنەی کە کەشتیی تیادا دەوەستێت یان چاك دەکرێتەوە. |
| حوض (للجسم) | Pelvis | سێ بەندە، بریتییە لە شەش ئێسقان سیان لای راستو سیان لای چەپ، لە شێوەی حەوزدا تێ هەڵکێشن، هەندێك لە ئەندامەکانی لەشی تیادایە وەکوو میزڵدان. |
| حوض لتربية الأحياء المائية | Aquarium | حەوزی پەروەردەکردنی زیندەوەری ئاویی. |
| حوض لغطس الجلود | Tannery | تەغارلو، حەوزێکە یان دەفرێکە پێستەی تیا دەخوسێنرێت. |
| حوض لشرب الدواء | Watering-trough | حەوزی دەرمان خواردنەوە. |
| حوض الملاط | | دەستەبەرە، حەوزی قوڕو قسڵ، ئامرازێکە قوڕو قسڵی تیادا دەگیرێتەوە. |
| حوض التجريش،جرن | | دیبەگ، دنگ، دۆڵێکی دارینە برنجو ساوەری تیا دەکوترێت. |
| حوض التصريف | Drain-tank | گونج. |
| حوض النهر ، حوضية | River-valley | حەوزی رووبار، ئەو زەوییەیە کە رووبارێكو لقەکانی ئاوی دەدەن، ئاوکۆی رووبار. |

| | | |
|---|---|---|
| حوض كبير | Tank-cistern | سارينج، حەوزی گەورە. |
| حوض جاف | Dock | حەوزی وشك، حەوزێكی گەورەیە كەشتیی تیا چاكو بۆیە دەكرێتەوە. |
| حوضية، حلقة المحبوب= زهرة الحوض | Aquilegia | گوڵە حەوز، گیایەكە لە كۆمەڵەی گوڵاڵە گوڵەكەی گەورەیە لە ئەستێرە دەچێت. |
| حوفل، قلنسوة | Tip | كڵاوی رەگ، كڵاوی سەری رەگ، كە پارێزگاریی سەری رەگی رووەك دەكات. |
| حوق | Frame | چوارچێوە. |
| حوقلة، قارورة طويلة العنق | Vial-flask | سوراحی، سوراحیی ئاو. |
| حوقم | Pisonia, Cockspur | (پیسونیا)، (كۆكسپەر)، جقەی كەڵەشێر، دەوەنێكی دڕكاوییە لقەكانی بادراون بەرەكەی لینجە. |
| حوك، حبق، باذروج | Basil, Sweet-basil | ریحانە، گیایەكی بۆن خۆشە گوڵی سپی یان پەمبەیی دەگرێت. |
| حول، سنة | year | ساڵ. |
| حول، حول العين | Squint, squinting loxophthalmos | خێلیی، دەگەڕێتەوە بۆ ئیفلیجییەك لەو ماسولكانەی كە لە چاودانو چاو دەجوڵێنن. |
| حول | About | دەربارە. |
| حول، قوة | Power, ability | هێز، توانایی. |
| حول | Around | دەورووپشت، چواردەور، دەوروبەر، لەدەوری. |
| حولي، سنوي | Annual, Yearly | ساڵانە، ساڵیی ئەوزیندەوەرەی كە تەنها ساڵێك بژی. |
| حولي، عجل | Calf, Veal | گوێرەكە، گۆلك. |
| حولي ذكر، جدع | He- veal | نێوەن، گوێرەكەی مێ. |
| حولي انثى، عجلة جدعة | She-veal | پارێن، گوێرەكەی نێر، نەوەن. |
| حوم | Hovering | بە دەورو پشت داهاتن، خولدان، لە دەور سووڕانەوە. |
| حومل، سحابة سوداء | Black- cloud | هەوری رەش. |
| حومر، تمرهندي | Tamarind | تەمر هیند، خورمای هیندیی، درەختێكە بەرەكەی دەكرێت بە شەربەت. |
| حومان | Bread-root | رەگی نان، دەوەنێكە گوڵی سپی یان شین یان بنەوشەییی دەگرێت هەندێكی رەگەكەی مادەی نیشاستەیی تیایە دەكرێت بە نانو خواردەمەنی. |
| حۆول | Transformation, change | گۆڕان، لە بارێكی (دۆخێكی) بەرزەوە بۆ بارێكی (دۆخێكی) نزم. |
| حويصلة، نفطة، فقاعة | Vesicle, sac, Follicle | تورەكە، سیكلدانۆچكە، ئەندامێكە لە لەشی گیانداردا لە شێوەی توورەكەدا، دەرداوی لوەكان (گلاندەكان) كۆ دەكاتەوە وە بەكاریان دێنێت، یان شلە یان گازی تیادایە. |
| حويصلة رئوية | Air-sac, pulmonary alveoli | سیكڵدانۆچكەی سیی. |
| حويصلة منوية | Seminal-vesicle Gonecyst | تۆودان، سیكڵدانۆچكەی تۆ و، سیكڵدانۆچكەی شاوەت، سیكڵدانۆچكەی سپێرم، توورەكەی ئاوی نێر، توورەكەی سپێرم. |
| حويصلة الشعر، جراب الشعر | Hair follicle | سیكڵدانۆچكەی موو، پیازۆلكەی موو، سەلكی رەگی موو لەناو پێستدا. |
| حويصلة هوائية | Air- sac | سیكڵدانۆچكەی هەوا. |
| حويصلة غراف، حويصلة كراف، حويصلة جراف | Grafflan-follicle- Graaflan-follicie | سیكڵدانۆچكەی گراف، توورەكەی هێلكەدان، چەند توورەكەیەكی بچووكە لەناو هێلكەدانی ئافرەتدا هێلكەیان تیادایە. |
| حويصلة باير | Baer-vesicle | سیكڵدانۆچكەی بایەر ئەو گەرایەی (هێلكەیەی) كە لە سیكڵدانۆچكەی كرافدا هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| حويصلة المرارة، حويصلة الصفراء | Gall- bladder | سیکلدانۆچکەی زراو، کیسەی زراو، توورەکەی تالاو. |
| حويصلة خيطية | Trichocysts | سیکلدانۆچکەی دەزوولەیی. |
| حويصلة جنينية | Blastula | (بلاستولا)، هەنگاوێکی سەرەتاییە لە هەنگاوەکانی گەورەبوونی بێچووی زۆربەی گیاندارەکان لە منال داندا. |
| حويض، حوض الكلية | Pelvis of Kidney, venter of Kidney | حەوزۆکە،حەوزێکی (بۆشاییەکی) بچووکە لەناو گورچیلەدا میزی تیادا کۆ دەبێتەوە. |
| حويراء | Tephrosia | (تیفروسیا)، رووەکێکە بەشێوەی گیاو دەوەنو درەخت توێکلەکەی خۆلەمێشییە گەلاکەی لە پەر دەچێت گوڵەکەی سپی یان سوور یان بەنەوشەییە هەندێکی رەنگی جوێتیی نایابی لێ دەردەهێنرێت. |
| حويرة | London-rocket chamelaucion | (کووزەڵەی لەندەن)، دەوەنێکە لە کۆمەڵەی مۆرد گەلاو گوڵەکەی بۆن خۆشە بەرەکەی لە ترێ دەچێت یەك دەنکی تیایە. |
| حويزاوي | Redrice | برنجی سوور، جۆرێکە لە برنج. |
| حي | Alive, Bion | تاخ، زیندوو، زیندیی، زەندیی، زیندەوەر. |
| حياة | Life, Vita | ژیان، زیندویی، ژین، زیندوێتیی. |
| حيات | Ophidia | (ئۆفیدیا)، کۆمەڵەی مار. |
| حياء | Timidity, shyness | شەرم، ئابروو. |
| حياتي | Vital | زیندەوەریی، ژیانیی، زیندوێتی. |
| حيازة، امتلاك | Possession | بوون، هەبوون، یەکێك شتێکی هەبێت. |
| حيازة | Obtainment | بەکارهێنان، ئەوەیە کە مرۆڤ شتێك بەکار بێنێ هینی خۆی نەبێ وەکوو خانوو. |
| حياكة، حوك | Knitting , Weaving | جولایی، تەون گەریی، تەون کردن، کۆرس. |
| حياصة | Breaching | هەیاسە، پشتێنێکە لە زێر یان زیو، ئافرەت دەیبەستێت بۆ جوانیی. |
| حياد، محايدة | Neutrality | گۆشەگیریی، بێ لایەنیی،کەنارگرتن. |
| حيال، محتال | Cunning, Wily, Sly | فێڵباز، جامباز. |
| حيال، ازاء، امام | Before, Infront-of | بەرامبەر لەبەردەم. |
| حياة نباتية | Flora | (فلۆرا)، ژیانی رووەکیی، کۆمەڵەی روەك لە ناوچەیەك یان سەردەمێکدا. |
| حياة حيوانية | Fauna | (فاونا)، ژیانی گیانداریی، کۆمەڵەی گیاندار لە ناوچەیەك یان سەردەمێکدا. |
| حي العالم، حيون | Orpine, stone-Crop, house-leeK, Sempervivum | هەمیشە بەهار گیایەکی ساڵانەی پزیشکییە (١٣٠) جۆری هەیە هەندێکی گوڵی سوور یان سەوز دەگرێت. |
| حية الفعى | Snake serpent | مار، باشقیبان، جۆرەکانی وەکوو سفرەمارو سەرە مێوژەو کەومارو زەردەمارو رەش مارو تیرەمار. |
| حية ، ثعبان | Serpens | بەرجی مار، کوڵووی مار، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باکوورییە. |
| حية غربيد | Sawscaleod-viper | مارێکی ژەهراوی شاخدارە. |
| حية طفارة، حية قفازة | Zamenis | ماری بازدەر، تیرەمار، کوڵەمار، مارێکی باریکی مەیلەو سوورە، بازدەدات. |
| حية ذات نظارة، صل ناشر، كوبرا | Cobra | (کۆبرا) مارێکی زۆر کوشندەیە، کە توورە دەبێت ملی دەئاوسێت. |
| حية صل مصرية، ناشر مصرية | Naia-haji | کۆبرای میسریی. |

| | | |
|---|---|---|
| حية، حنش، حنش اسود، حية سوداء | Lacertine-snakecoluber Black-snake | رەشمار. |
| حية كبيرة، تنين | Dragon | ئەژدەها، زەها، ئاژدیها، مارێکی خەیاڵییە. |
| حية صغيرة، | Young-Snake | تووڵەمار. |
| حية سوداء | | (راجع) حيه حنش. |
| حية ضواء | | سیسە مار، جۆرە مارێکی زەردی ڕیوەڵەیە (باریکە). |
| حية اناكندة | Anaconda | (ئەناکوندە)مارێکی زۆر گەورەیە لە ئەمریکا دەژی. |
| حية صلالة، حية ذات اجراس، قرطال | Rattle-snake | ماری زەنگوڵەدار، مارێکە کە دەجووڵێت دەنگێکی وەکوو دەنگی زەنگوڵەی لێوە دێت. |
| حية ارقم | Zamen-periops-diaema-diadema | مارێکە هێڵی ڕەش‌و سوورو سپی تیادایە. |
| حية زجاجية | Glass-Snake | ماری شووشەیی، مار شووشە، جۆرە مارمێلکەیەکە قاچەکانی زۆر لاوازو بچووکن یان بێ قاچو دەستە. |
| حية ارقم بيتي، جان | Zamenis-ravergieri | مارێکی زەردی بێ زیانە لەناو ماڵاندا دەژی. |
| حية مرجانية | Coral-Snake | (ئیلاپید) ، ماری شیلانیی، مارێکە پێستەکەی ئەلقەی ڕەش‌و سپی‌و سووری تیادایە، بچووک‌و ژەهرینە. |
| حية البايثون، حية الصخر، اصلة، تنين بري | Python, Boa | (پایثۆن) ماری بەرد، جۆرێکە لە مار زۆر گەورەیە هەندێك جار درێژییەکەی دەگاتە (٢٥) سانتیمەتر، بەڵام ژەهری نییەنێچیرەکەی قووت دەدات‌و تێکی دەشکێنێت. |
| حية بتراء، حية الحفر | Tailless-viper | کوڵەمار، کوڵەوەبیاب، جۆرە مارێکی ژەهراوییە، بە ڕۆژ کەم دەجوڵێت، کلکی لە جگەرە دەچێت. |
| حية دفانة، دساس، أعيرج، نكاز، حية الرمل | Sand-SnaKe Sand-Boa | ماری لم، مارێکی کورتی سوورە ژەهری نییە ، خۆی دەکات بەژێر لمدا. |
| حية عمياء، | Blind-snaKe | کوێرەمار. |
| حية حفث، حفاث | Coluber | ڕەش مار، مارێکی بێ ژەهرە. |
| حية الماء، حية البحر، مقين الماء | Hydrophis, sea-snaKe, water-Spout | ماری ئاویی، مارێکی گەورەی ژەهراوییە ڕەنگی پشتەکەی سەوزێکی کاڵی مەیلەو ڕەشە، ڕەنگی سکەکەی لەنێوان سپی‌و زەردی پنکە پنکە یان پەڵە پەڵەی ڕەشدایە. |
| حية ملونة، حية رقطاء | Coloured- snake | کەومار، شڵەمار، مارێکی پنکە پنکەیە. |
| حية، افعى | Viper, Adder | مارێکی سەر گەورەی مل باریکی پیسە. |
| حية طفية | Carpet-viper | فەرشەمار، مارێکی زۆر پیسە. |
| حية قرناء، حية مقرنة، حية ذات قرنين | ceraste, Horned-viper | ماری شاخدار، ئاژدیها. |
| حية ناظر، حية رقيب | Cat-snaKe | مارە پشیلەیی، مارێکی زۆر پیسە. |
| حية الجابون | Gaboon-viper | ماری گابوون، مارێکی ژەهرینی ترسناکە، بەقەدەر قوڵی مرۆڤێك ئەستوور دەبێت، پەڵەی سوورو شین بەسەر لەشیەوەیە. |
| حية مطوقة، حية الحشائش | Ring-ne[illegible] SnaKe | ماری تەوقدار، ماری ناو گیا، مارێکی ڕەنگاوڕەنگە، هێڵێکی بازنەیی لە ملدایە. |
| حيتان | Cetaceans | (سیتاشین)، نەهەنگەکان، کۆمەڵە گیاندارێکی شیردەری ئاوی کەتەن شێوەیان لە ماسی دەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| حيدر، اسد | Lion | شێر. |
| حيد | ledge | رەفە، لووتکەی شاخ. |
| حيدة، عقدة | Ring | گرێ، وەکوو گرێی قەدی قامیش. |
| حيدار | Ganister | (گانیستەر) بەردێکی لمی سلیکی رەقە لەدروستکردنی ئەو جۆرە خشتانەدا بەکاردێت کە ناوپۆشی تەنور (کورە)ی پێ دەکرێت. |
| حيدان، حيود | Deviation, Diffraction | لادان، لادانی تیشکی رووناکیی یان دەنگ کاتێك کە بەر کۆسپێك دەکەوێت. |
| حيذوان | Rock-dove | کۆتری بەردەلانی، جۆرێکە لە کۆترە کێویی خۆڵەمێشیيە هێڵی سپیو سەوزو بنەوشەیی تیایە. |
| حيرة، ارتباك | Perplexity | سەرسامیی، داماویی، واق ورمان، پەشۆکان، دامان. |
| حيرم | Bubalis | (بوبالیس)، جۆرێکە لە مانگا کێویی ناوشانی بەرزە سمتی نزمە. |
| حيز | lumen | بۆشایی، دەلاقە، کەلێن، کەلەبەر، جێگە. |
| حيزبون، عجوز، شمطاء | Crone, hag | پیرێژنە سەر ناسیننە، پیرێژن، پیرێژنە قارپی. |
| حيزوم، خطم | Rostrum | لموز، قورتم. |
| حيص، عاقول، شوك الجمال | Camel-thorm | وشترخوار، جۆرە گیایەکە بۆ لەوەڕ. |
| حيصل، حدق | Egg-plant | باینجان، باینجانی رەش. |
| حيض، طمث | Lunaria, Catamenia menses, menstruation | بێ نوێژیی، حەیز، کنج، وەهك، شفتو شۆ. |
| حيض كاذب | Pseudomens-truation | بێ نوێژیی درۆزنە. |
| حيق | Result | ئەنجام. |
| حيقط، حيقطان، حيقان،دراج | Pternistes, francolin | پۆڕ، زیوەکەو، کەناچە،، زرەکەو، سوێسکەی رەش. |
| حيلة، خدعة | Trick, shift | فێڵ،لیپ، گزیی، پەنگ، کەڵەك، پیلان، گەرەلەسە، تەڵەکە، تەڵەکەبازیی. |
| حي لاهوائي | Anaerobe | زیندووی بێ هەوا، زیندوو، بە بێ هەوا. |
| حيلولة | Prevention, Separation | قەدەغەکردن، نەهێشتن. |
| حيمن، مني، حيوان منوي | Sperm | (سپێرم)، توخم، تۆوی پیاوەتیی، ئاوی پیاو، شاوەت، خانەی رەگەزی نێر کە لە گەڵ هێلکەی مێدا یەك دەگرێتو خانەیەکی بە پیت لە منداڵداندا پێك دەهێنێت، ئەمیش بەرە بەرە نەشونمادەکاتو پێچوولەی (منداڵ) لێ پێك دێت. |
| حين | Epoch, period | چاخ، پیل، بافت، تاڤ، رۆژگار، بەشێکە لە بەشەکانی سەدەی جیۆلۆجیی. |
| حيهل | | دەوەنێکی ژەهرینە. |
| حيوان | Animal, Zoon-Zoa | گیانەوەر، گیاندار گیان لەبەر، زیندەوەرێکە دەجوڵێتو توانای رۆیشتنی هەیە بەڵام ناتوانێت خواردەمەنیی بۆ خۆی دروست بکات، هەست دەکاتو دەخواتو هەناسە دەداتو پیسایی دەردەداتو گەورە دەبێتو دەمرێت. |
| حيوان طحلبي | Bryozoon | (برایۆزوون)، گیانداری قەوزەیی، گیاندارێکی ئاویيە لە کرم دەچێت. |
| حيول انثى البهائم | Sexual-excitement inanimals | بە کەڵیی، بە تەڵەبی، ئاڵۆشی رەگەزیی، لە مێی گیاندارەدا. |
| حيوان وحشي، حيوان متوحش | Wild-animal, Beast | گیانداری کێویی. |
| حيوان مفترس | Beast | گیانداری دڕندە. |

| | | |
|---|---|---|
| حيوان متعدد الخلايا، حيوانات عديدة الخلايا | Metazoa | (ميتازوا)، گیانداری فرەخانە، هەر گیاندارێك لەشی لە یەك خانە زیاتر پێك هاتبێت. |
| حيوان خنثي، حيوان ثنائي الجنس | Hermaphrodite | گیانداری نێرەمووك، ئەو گیاندارەی كە ئەندامی نێرو ئەندامی مێی لە هەمان كاتدا تیادایە. |
| حيوان اوبليا | Obelia | (ئۆبیلیا)، گیاندارێكی دەریای ساكارە بە بەردی قەراغ دەریاكانەوە دەنووسێت. |
| حيوان المرجان | Coral | شیلان، گیاندارێكی دەریاییە خۆی بە بەردو رووەكی ناو دەریاوە دەنووسێنێت مادەیەكی كلسی دەردەدات لە شێوەی درەختی لقاردابە رەنگی پەمبەیی یان رەش یان سپی. |
| حيوان جانبي التناظر | Bilaterally, symmetrical | گیانداری هاوتا تەنیشتیی، گیانداری لاهاوتا،گیاندارەی كە هەردوو لاكەی (راستو چەپ) لە یەكتری دەچن وەكوو لە مرۆڤدا. |
| حيوان احادي الجنس | Mono sexual Monogony | گیانداری تاك رەگەز، گیانداری نێرە یان مێیە. |
| حيوان متغير الحرارة، حيوان ذو دم بارد | Cold blooded animal | گیانداری خوێن سارد، گیاندارێك كە گەرمی لەشی بگۆڕێت، گیانداری گەرمی گۆڕاو وەكوو مار. |
| حيوان ثابت الحرارة، حيوان ذو دم حار | Haematothe rmals warm-blooded animal | گیانداری خوێن گەرم، گیانداری گەرمی نەگۆڕاو، ئەو گیاندارەی كە پلەی گەرمی لەشی بە جێگیری دەمێنێتەوەوە وەكوو مەڕ. |
| حيوانات راقية | Primates | گیاندارە باڵاكان، ئەو گیاندارانەی كە ژیریی و پێكهاتنی لەشیان لە پلەیەكی بەرزدایە وەكوو مرۆڤ. |
| حيوان بري | Earthly-animal | گیانداری وشكیی. |
| حيوان مائي | Aquatic-animal | گیانداری ئاویی. |
| حيوان متطفل | Zooparasite | گیانداری مشەخۆر، وەكوو كرمی جگەر. |
| حيوانات ابتدائية | Protozoa | (پرۆتۆزوا) گیاندارە سەرەتاییەكان، ئەو گیاندارانەی كە لەشیان لە یەك خانە پێكهاتووە، وەكوو ئەمیبا. |
| حيوان لافقري | Invertebrata | گیانداری بێ بڕبڕە، ئەو گیاندارەی كە بڕبڕەی پشتی نییە وەكوو كرم. |
| حيوانات فقرية | Vertebrata | گیانداری بڕبڕەدار وەكوو شیردەر یان باڵندە یان ماسیی. |
| حيوانات جرثومية | Sporozoa | (سپۆرۆزوا)، ئەو گیاندارە سەرتاییە یەك خانەییانەی كە هۆی جووڵانەوەیان نییە وەكوو پلاسمۆدیۆم. |
| حيوان مفصلي، مفصليات | Arthropoda | گیانداری جومگەیی، گیانداری جومگەدار وەكوو هەزار پێ. |
| حيوان واطيء | | گیانداری نزم وەكوو كرمو مێروو. |
| حيوان قشري/ قشريات | Crustacea | گیانداری توێكڵدار، وەكوو قرژاڵ. |
| حيوان ضاري، ضواري | Carnivora | گیانداری زیانبەخش،زیندەزیان، گیاندارێكی شیردەری گورگو گۆڵی وەكوو شێرو پڵنگ. |
| حيوانات مخلبية | Onychophora | گیاندارە چڕنووكدارەكان، وەكوو گیانداری پێریپاتس. |
| حيوان مجتر حيوانات مجترة | Ruminants | گیانداری كاوێژكەر، وەكوو ئاژەڵ. |
| حيوانات حلقية، حلقيات | Annelida | (ئەنیلیدا)، گیاندارە ئەلقەدارەكان وەكوو كرمی زەویی. |
| حيوانات درداء، حيوانات عديمة الأسنان | Edentata | گیاندارە بێ ددانەكان، گیاندارە دەم پووچەكان وەكوو گیانداری تەمەڵ(كسلان). |
| حيوانات حبلية، حبليات | Chordata | (كۆرداتا)، گیاندارە پەتدارەكان، ئەو گیاندارانەی كە بڕبڕەی پشتیان نییە بەڵام پەتێكی دەمارییان هەیە وەكوو گیانداری رەۆكە(رميح). |

| | | |
|---|---|---|
| حيوانات لحمية | Sarcodina | (ساركۆدينا)، گياندارە گۆشتىيەكان وەكوو ئەميبا. |
| حيوانات سوطية، سوطيات | Mastigophora | (ماستيگۆفۆرا)، گياندارە قامچىدارەكان وەكوو يوگلينا. |
| حيوانات حزازية | Bryozoa | گياندارە گلەوەزيىيەكان، گياندارە كەڤزىيەكان(گلەوەر، كەڤز جۆرە روەكێكە لە قەوەزە دەچێت). |
| حيوانات هائمة | AniMal-plankton | گياندارە ئاوارەكان گياندارە داماوەكان ئەو گياندارە وردانەی كە لەسەر رووی ئاو دەژين. |
| حيوانات دوارة،حيوانات دولابية | Rotifera | گياندارە خولاوەكان، جۆرەگياندارێكن بە ميكرۆسكۆب دەبينرێن ريزە برژانگيان هەيە بەشێوەی بازنەيەك يارمەتىيان دەدات بۆ جولانەوە. |
| حيوان رمي حيوان رمام | Saprozoic | گياندارى بەرماوەخۆر، گياندارى لاشەخۆر. |
| حيوانات ذوات الأربع، سائمة، بهائم | Quadrupeds | گياندارە چوارپێيەكان. |
| حيوان قليل الحليب | Lactifuged-animal | ئاژەڵی كەم شير، جێردۆ، بێژەك، بيژۆ، عەبرەش. |
| حيوان داجن،حيوان أهلي | Domestic-animal | ئاژەڵی ماڵی، گياندارى ماڵی وەكوو سەگو مريشك. |
| حيوانات ثديية، ثدييات، حيوانات لبونة | Mammals | گياندارە مەمك دارەكان، گياندارە شيردەرەكان، وەكوو ئاژەڵ. |
| حيوان قاضم، حيوان قارض، (قوارض) | Rodent | گياندارى قرتێنەر، هەر گياندارێكی شيردەری بێ كەڵبە وەكوو مشك. |
| حيوان صدفي، صدفيات | Ostracodes | گياندارى سەدەفداروەكوو گوێچكەماسيى. |
| حيوان ثلاثي الفص | Trilohite | گياندارى سێ قاش، گياندارى سێ كووز، گياندارى سێ پل، گياندارێكی جومگەدارى دەريايى قرتێكەوتووە لەشی سێ قاش بوە. |
| حيوان مخصي | Castrated-animal | گياندارى خەساو، يەختە، خەسێنراو. |
| حيوان ثنائي الفص | Dilobite | گياندارى دوو قاش، گياندارى دوو كووز، گياندارى دوو پل. |
| حيوان بلوطي الخرطوم | Balanoglossus | گياندارى لمۆز بەڕۆ، گياندارێكە لەكرم دەچێت لمۆزی هەيە، لەناو قوڕی قەراغ دەريادا دەژی. |
| حيوان ولود | Viviparous | گياندارى بزۆك، وەكوو مانگا. |
| حيوان ولود بيوض | Viviparous-oviparous | گياندارى هێلكەزاو،گياندارى هێلكەزا، گياندارێكە هێلكەكەی هەر لە سكی مێيەكەيدادەتروكێت و ێچووەكەی لەسێ دێتە دەرەوە وەك دووپشك. |
| حيوان نباتي | Phytozoon | گياندارى رووەكی گياندارێكە كە لە رووەك بچێت وەكوو ئيسفەنج. |
| حيوان مائي،أخضر هايدرا | Hydra | (هايدرا)، گياندارێكی ئاوی سەوز، درێژىيەكەی نزيكەی يەك سانتيمەتر دەبێت، سەرەكەی نزيكەی (٦-٨) پەلی پێوەيە، خۆی بە رووەكە ئاوىيەكانی ترەوە هەڵدەواسێت، ئەگەر لەشی پارچە پارچە بكرێت هەر پارچەيەكی نەشونما دەكاتەوەو دەبێتەوە بە گياندارێكی تازەی سەربەخۆ. |
| حيوان مائي مركب | Complex-aquatic-animal | گياندارى ئاويى ئاوێتە، گياندارێكی ئاويى ئاوێتەيەكە بريتىيە لە چەند كۆمەڵە گياندارێكی ئاوی كە لە شێوەو فرمانداجياوازن، هەموو پێكەوە كۆمەڵەبوون بە جۆرێكی ئەوتۆ كە لە يەك گياندار دەچن، درێژی ئەم كۆمەڵە گياندارە نزيكەی (١٥) سانتيمەتر دەبێت، لە دەرياكانی ناوەراستی ئەورووپادا دەژی، سەرەوەی لە هێشووی ترێو ناوەراستی لە هێشووی مۆزو خوارەوەی لە هێشووی خورما دەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| حيوان ذهبي، حيوان ابو الذهب | Jellyfish, Gold animal | گیانداری زێڕیی، گیاندارێکە لە دەریای ئەتلانتیك و دەریای سپی ناوەڕاستدا دەژی، سەلکەکەی شینەچەترێکی پان و چوارپەل توکنی هەیە ، زۆر سووکە سەر ئاو دەکەوێت. |
| حيوانات زهرية | Anthozoa | گیاندارە گوڵ گوڵی‌یەکان، وەکوو شیلان (مرجان)و گوڵاڵەی دەریا. |
| حيوانات كاسية، فنجنيات | Scyphozoa | گیاندارە کاسەیی‌یەکان، وەکوو چرای دەریا. |
| حيوانات ظلفية، ظلفيات | Hoofed-animals | گیاندارە سمدارەکان،وەکوو وڵاخ. |
| حيوانات مشعة | Actinozoa | گیاندارە تیشك دەرەوەکان، وەکوو گیانداری رادیۆلاریا. |
| حيوانات مشيمية | Placentalia | گیاندارە وێڵداشی‌دارەکان وەکوو مەڕو بزن. |
| حيوان هلامي، قنديل البحر | Jelly-fish | چرای دەریا، سی دەریا، ماسی‌یە لینجە، گیاندارێکی وڵوڵەیی، دەریایی‌یە لە شەودا رووناکیی دەداتەوە رەنگەکەی شینە. |
| حيوان منوي، حيمن | Sperm, spermatozoon | (سپێرم)، گونەزا، تۆم، شاوەت، ئاوی پیاو، خانەیەکی کلکدارە لە گونی گیاندارا پەیدا دەبێت و فڕێ دەدرێتە دەرەوە، لەگەڵ گەرای مێدا یەك دەگرێت و گەرای بە پیت دروست دەبێت، ئەمیش لە دواییدا دەبێت بە بێچووله. |
| حيوان برمائي، برمائيات | Amphibians | گیاندارە تەڕوو وشکی‌یەکان، وەکوو بۆق. |
| حيوانات وترية الأظلاف | Perisodactyla | گیاندارە تاك سمەکان وەکوو کەرو ئێستر. |
| حيوانات شفعية الأظلاف | Artiodactyla | گیاندارە جووت سمەکان، وەکوو ئاژەڵ و ئاسك. |
| حيوان مرضع، ظئر | Wet-nurse | بانۆك، گیاندارێکە کە شیر بدات بە بێچووی گیاندارێکی تر. |
| حيوان سمين | Fat animal | شیشمان، گیانداری قەڵەو. |
| حيوانات كيسية، حيوانات جرابية | Marsupials | گیاندارە توورەکەدارەکان، گیاندارێکی شیردەرە ، مێیەکەی توورەکەیەکی هەیە لەبەر سکیدا بێچووە لاوازەکەی تێ دەخات و تیایدا پەروەردەی دەکات هەتا وەکوو گەورە دەبێت وەکوو کەنگەر. |
| حيوانات هدبية، نقاعيات | Ciliata, Infusoria | گیاندارە برژانگ دارەکان، ئەو گیاندارانەی کە بە هۆی برژانگەوە دەجوڵێن وەکوو گیانداری پارامیسیۆم. |
| حيوانات مثقبة | Foraminifera | (فۆرامینیفرا)، گیاندارە کون کونەکان، گیاندارێکی سەرەتایی دەریایی‌یە، قاڵبەیەك بە دەوری خۆیدا دەردەدات کە دەمرێت دەکەوێتە ژێر دەریاوە، زۆرجار قاڵبەکەی لەناو ئەوتی سروشتییدا دەبینرێت. |
| حيوانات اكلة نباتات | Herbivorous | گیاندارە رووەك خۆرەکان وەکوو ئاژەڵ. |
| حيوانات اكلة الحشرات | Insectivora | گیاندارە مێرووخۆرەکان وەکوو ژیشك. |
| حيوت | Male-snaKe | نێرەمار، ئاشقە. |
| حيون، حي العالم | Orpine, Stone-crop, semperivum, house-leeK | هەمیشە بەهار، رووەکێکی گیایی‌یە گوڵێکی زەرد دەگرێت. |
| حيوي | Biotic, vital | زیندوویی، زیندەوەریی. |
| حيوية | Vitaliy | زیندوێتیی، گورج و گۆڵی، چالاکیی. |
| حيوة، سفرجل | Quince, Cydonium | بەهێ، بەی ، بێهـ، درەختێکە بەرێکی زەردی خڕی بۆن خۆش دەگرێت دەخورێت و دەکرێت بە مرەبا. |
| حيود، حيدان | Diffraction, deviation | لادان، لادانی تیشکی رووناکی بە رادەیەکی کەم کاتێك کە بە کونێکی بچووکدا دەڕوات. یاخود لادانی دەنگ یان رووناکیی لە ئەنجامی بوونی تەگەرەیەك لەبەر دەمیدا. |
| حي، حارة | Quarter | گەڕەك. |

| | | |
|---|---|---|
| حي، عائش | Alive | زیندەوەر، زیندوو،ژیاو، زرپ، زێندیی. |
| حي منتج | Producer, animal | زیندەوەریی پەیداکەر، زیندەوەری بەرهەم هێنەر. |
| حي محلل | Analyzer-animal | زیندەوەری شیکەرەوە. |
| حي مجهري | Biomicroscopic | زیندەوەری میکرۆسکۆپی. |
| حي بالهواء،حي هوائي | Aerobic | (ئێرۆبیك)، زیندە بە هەوا، ئەو زیندەوەرەیە کە بە هەوای بەرملاّ نەبێت ناژی. |

| | | |
|---|---|---|
| خائب، يائس | Hopeless, Despairing | شکست، هیوابڕاو، نائومێد، ناهومێد. |
| خائف | Afraid, Law ful | ترسنۆك، ترساو، تۆقیو، وازر. |
| خائتة | Imperial-eagle | شادال، جۆرە دالێکە. |
| خابئة، خابية، وعاء كبير | Vat, dolium, Large vessel | کۆلین، کووپەی گەورە، خوم، دەن. |
| خابور، بيلسان، أسود، خمان كبير، سمبوقة | Arn- tree, Eader-tree Balm-tree, Balm tree | بەیلەسانیی رەش، داری ئیلدەر، داری ئەرن، داری بون، درەختی دیاریی، جۆرە درەختێکە گوڵەکەی بەشێوەی هێشووی بۆن خۆشە بەرەکەی لە ترێ دەچێت، گوڵەکەی پزیشکیو بۆن خۆشە. |
| خابور، وتد | Plug, peg | سنگ، مێخ. |
| خابور، اسفين | Wedge | پواز. |
| خاتمة، ختام | End | کۆتای، دوایی، دوماهیی. |
| خاتم | Ring, Finger-ring | ئەموستیلە، ئەنگوستیلە، پەنجەوانە، ئەنگوشتەریی،مێنەکە، گوستیرك. |
| خاتم سليمان | Millipede | کایە، تەتەڵەمیران، گیاندارێکی رەشباوی کوڵکنی بەهاریی، جومگەداری درێژە، دوو ریز قاچی هەیە لە هەزار پێ دەچێت. |
| خاتم سليمان، عقداء | Seal-wort, Salomons-Seal | رومکی مۆر، مۆری سلێمان، رومکێکە لە کۆمەڵەی زەمەق قەدی ژێر زەویی هەیە کوڵەکەی بەشێوەی هێشووی سپی مەیلەو سەوزە یان پەمبەییە. |
| خاتون، سيدة | Lady | خاتوو، بانوو، خاتم، خان. |
| خاثر | Thromb osed | مەییو. |
| خاثر،لبن رائب | | ترۆڵە، ماست. |
| خادرة، عذراء | Chrysalls | کەنیشکەی قۆزاخە، قۆزاخەی مێروو، مێتولکەی ناو قۆزاخە،مخێتوولکەی مێروو لە قۆزاخەدا بەر لەوەی ببێت بە مێروولەیەکی تەواو. |
| خادر | Torpent | گۆت، پەك کەوتوو. |
| خادع، مخادع | Deciever | فێڵباز، تەڵەکباز، فریودەر. |
| خارج | Out | دەرەوە، دەرڤە. |
| خارجي | Outer, external | دەرەوەیی، دەر. |
| خاروج، نخلة | Palm-tree | دارخورما. |
| خارطة، خريطة | Map | نەخشە. |
| خارصين،زنك، توتيا | Zinc | (زینك)، توتیا توخمێکی کیمیاییە کێشی (ئەتۆمی) گەردیلەییەکەی (۳۷و٦٥)و ژمارەی ئەتۆمییەکەیشی (۳۰)، رەنگەکەی سپی مەیلەو شینەلە هەندێك پیشەسازیدا بەکاردێت وەکوو پیشەسازی چینکۆ و رووکەشکردنو دەرمانی مێشو مەگەزو دەرمانیتر نیشانەکەی (Zn). |
| خارصينات | Zincate | (زینکەیت) خوێیەکە لە یەکگرتنی زینك لەگەڵ مادە قلێییەکاندا پەیدا دەبێت. |
| خارصين ابيض، اوكسيد الخارصين | Zinc-white, zinc-oxide | (زینك ئۆکساید)، ئۆکسیدی زینکی، زینگی سپی، توتیای سپی، ژەنگی توتیا، مادەیەکە لە دروستکردنی بۆیەدا بەکاردێت. |
| خارج القسمة | Quotient | بەش، ئەنجامی بەشکردن، بەرکەوت. |
| خارق | Extraordinary | نەکراو، نەبینراو، بەتین، بەهێز، نائاسایی، سەروو ئاسایی. |
| خارق، ناقب | Penetrating | سمەر، سمێنەر، کون کەر. |
| خازوق، قازوق | Pile | مێخ، سنجووق، سنگ، سنگێکی گەورە. |

| | | |
|---|---|---|
| خازن البندق، خازن الجلوز، كاسر، الجوز | Sitta, nuthatch | (سيتا)، گوێزشكێن، گوێزچن، باڵندەیەكە لە چۆلەكەوە گەورەترە پشتەكەی شینی ژەنگارە، بەرسكی سپییە، دەنووكی گەورەیە حەز لە گوێز دەكات. |
| خاسر | Loser | دۆڕاو، زیان لێكەوتوو. |
| خاشية | Tetranychida | (تیترانچیدا)، مێرووە قووچەكی، مێروویەكی شێوە قوچەكیی زیانبەخشە بە رووەك. |
| خاشبات | Xylophagous | تەختە خۆرەكان، ئەو مێروانەی لەسەر ریشاڵی روەك (تەختە) دەژین. |
| خاصية، خاصة، ميزة | Characteristic property | رەووشت، خاسیەت، سیفەت، نیشانە. |
| خاصرة، خصر | FlanK | كەلەكە، كەمەر، پاڵو، ناوقەد، كێلەك، قەبرغە. |
| خاصية شعرية، جذب، شعري | Capillarity | رەوشتی مووری، خاسیەتی مووری، ئەو هێزەیە كە دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی شلە بە بۆرییەكی زۆر باریكدا كە وەكوو موو بێت ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ زاڵبوونی هێزی پێكەوە نووسان لەنێوانی شلەكەو دیواری بۆرییەكەدا بەسەر هێزی پێكەوە نووسان لەنێوانی (مولیكیولەكانی) گەردی شلەكەدا. |
| خاصية الأخلاف | Regeneration | رەوشتی دروستكردنەوە، رەوشتی هێنانەوەجێ، واتا نوێكردنەوەی ئەندامیی وون بوو یان بڕڕاو لە هەندێك گیانداردا وەكوو لە هایدرایا مارمێلكەدا، ئەگەر مارمێلكە كلكی بقرتێت كلكی تازە دروست دەكاتەوە. |
| خاصية كيمياوية، خواص، مقومات | Chemical- property-characteristic | رەوشتی كیمیاگەریی، خاسیەتی كیمیایی. |
| خاصية طبيعية | Natural-property-Natural-characteristic | رەووشتی سروشتی، خاسیەتی سروشتی. |
| خاصة | Specially | بەتایبەتیی، ئەخوازا. |
| خاص | Specific, characteristic | تایبەتی، خوسەر. |
| خاصية التأصل | Allotropy | رەوشتی چەند شێوەیی، بوونـی مادەیەك (توخمێك) بە دوو شێوەی جیاوازیان وەكوو لە گۆگردی لاستیكیی و گۆگردی پوازكیدا. |
| خاصية تعدد الأشكال | Polymorphism | خاسیەتی چەندنەوەیی، خاسیەتی چەندبەرەیی، بوونی چەند نەوەیەكی جیاواز بۆ یەك گیاندار وەكوو بوونی شاژن و نێرەو كارەكەر لە هەنگدا. |
| خاضب، صباغ | Colouring | رەنگ. |
| خاضل | Wet, Moisten | ئاودار، تەڕ، شێدار. |
| خاضلة، رابلة | Plant-eating | مێرووی روەك خۆر. |
| خاطوم، ذو خطم | Muzzled, Snouted | لەوزدار، وەكوو قالۆنچەی لمۆزدار، تیمساحی لمۆزدار. |
| خاطرة، فكر | Notion, idea | بیر. |
| خاطف الذباب،شورب، بوبانة، مذباب | Fly- catcher | مێش گر، جۆرە چۆلەكەیەكی بەڵەكە مێش دەخوات. |
| خاطف ظله، رفراف، صياد السمك | Kingfisher | ماسی گرە، شاماسیگرە، باڵندەیەكە دەنوكێكی بەهێزو لاكێشەیی هەیە كلكی پانە ماسی و بۆق و گیانداری ئاوی تر دەخوات. |
| خاطية، خائنة، ملك العقبان، عقاب قيصرية | Imperial eagle | داڵـی شایی، شاداڵ داڵاش، باڵندەیەكی گۆشت خۆرە، راوی ئاسك و ریوی و كەروێشك و مشك دەكات و دەیان خوات. |
| خافش * | Lucifugous | مێرووی شەوگەڕ، هەر مێروویەك بەشەو بگەڕێت. |
| خافور | Wild- oat-grass | هەرزنە كێویلە، گیایەكی دەشتەكییە لە كۆمەڵەی دەغڵودان بۆ لەوەڕ باشە. |
| خافور الجمال، زمير، خرطال فتوا | Wild-oat, Flaver, Drake | مرۆر، زیزانە، گیایەكی زیانبەخشە لەناو دەغڵودانداا دەڕوێت. |

| | | |
|---|---|---|
| خافت | Faint | كز، نزم. |
| خافق، ضارب | Palpitating Beating | ليدەر، پرتەكەر. |
| خافق العين | Fluttered-eye | چاوپرتەكەر. |
| خافق، قيفاوس، ملتهب | Cepheus | (سيفوس)، پرتەكەر، ئەستێرەيەكى پرتەكەرە پرشنگەكەى ناوبەناو بەشێوەيەكى رێك‌وپێك دەگۆڕێت. |
| خافقي، طلاء الحيطان | Stucco | بۆيەى ديوار. |
| خافقان، ا لشرق و الغرب | The east-and the west | خۆرھەلاتو خۆرئاوا. |
| خافية، سر | Secret | نھێنيى. |
| خافض | Deprssor | نزمكەرەوە، نەوێنەر. |
| خالي، فارغ | Empty | بەتاڵ، چۆڵ، خاڵى، بۆش،ڤالا. |
| خال، شامة | Mole | خاڵ، نيشانە، پەڵەيەكى رەشە لەسەر پێست. |
| خالق | Creater, Maker | دروستكەر، كردگار، هێنەرەبوون. |
| خالص، نقي | Pure , Clear | خاليسە، پاكيزە، خۆلاسە، پەتيى. |
| خالد | Eternal | نەمر، ڤەمان. |
| خالدة، هليكريز | Eternal-flower | (هيليكريزەم) گوڵە نەمر، گيايەكە گوڵى بچووكى زەرد دەگرێت. |
| خالدة الجزر،أمارنطون، بزر العذراء | Gold-flower | گوڵە ئالتونى، گوڵە زێرينە، گيايەكە گوڵێكى زەرد دەگرێت. |
| خامد، هاجع | Dormant, silent | خامۆش، دامركاو، داكاساو، داسەكناو. |
| خامل | Indolent, Inert | سست، تەمەڵ، خليچك، تەوەزەل، ئەو مادەيەى كار لێك ناكات لەگەڵ مادەكانى تردا وەكوو گازى هيليۆم. |
| خام، قماش | Calico | خام، شەمەد. |
| خام ابيض | White- calico | بلوورى، پاتيسقە، شەعادە، خامى سپيى. |
| خام اسمر | Brown-calico | چاو، خامى بۆر، جاوگ. |
| خام ملون شيت | Printed-calico, Chintz | چيت جۆرە قوماشێكى رەنگاورەنگە، لە لۆكە دروست دەكرێت. |
| خام(مادة (أولية) | Ore- Raw material | كەرەسەى خاو، هەرەمە، چەنگە، پرامى، رەشۆكيى، هەر كەڤرێك يان مەعدەنێك يان كانزاى لێ دەربهێنرێت وەكوو كانزاى بۆكسات وەكوو كەرەسەيەكى خاوە بۆ ئەلەمنيۆم (فافۆن). |
| خام معدني | Mineral | كەرەسەى خاوى كانزايى. |
| خامات ذرية | Atomic-ores | كەرەسەى خاوى ئەتۆميى، باشترين سەرچاوەيە بۆ وزەى ئەتۆميى كانزاتيشك دەرەوەكان،و گرنگترينى ئەمانەشى كەرەسەى يورانيۆمە، كە يورانيۆم(٢٣٥) بلۆتۆنيۆمى لێ دەردەهێنرێ جگە لە كەرەسەى كانزاى سۆريۆم، بۆ نموونە كەرەسەى (پتشبليند) كە بريتىيە لە ئۆكسيدى يۆرانيۆمو رەنگەكەى رەشە، (٥٠-٨٠) لە سەدا يورانيۆمى تيادايە، وە دەتوانين بڵێين كەوا بەشێوەيەكى گشتيى لەهەر تەنێك گڵو خۆڵدا (٢) گرام يورانيۆم هەيە،وە بە زۆرى لە كەنەدلو كۆنگۆ و خوارووى ئەفريقياو ئوستراليا و كلۆرادۆ هەيە. |
| خامس | Fifth pento | پێنجەم. |

| | | |
|---|---|---|
| خامس اوكسيد الفوسفور | Phosphorous pentoxide | پێنجەم ئۆكسیدی فوسفۆر، مادەیەكە بۆ وشك كردنەوە بەكاردێت. |
| خامس اوكسيد الڤاناديوم | Vanadium-pentoxide | پێنجەم ئۆكسیدی ڤانادیۆم، مادەیەكی هاندەرە لە وێنەگرتنی فۆتۆگرافیی و قوماش و جۆری تایبەتیی شووشەدا بەكار دەهێنرێت. |
| خمسة عشر | fifteenth | پانزەهەم، پانزەیەم. |
| خاما، اقطي، بلسان صغير، حاما اقطي | Ground-elder, Dam-wort | بەلەسانی بچووك، گیابەست، گیابەند، دەوەنێكی بچووكە بۆ رازاندنەوەی باخچەكان دەروێنرێت. |
| خاما قيس | Bastard-asarum | گیا گورچیلە، گیایەكی دەشتەكیی پزیشكیی‌یە گەڵاكەی لە گورچیلە دەچێت گوڵەكەی زەردو بۆن خۆشە. |
| خاما بوقي | Fishbone-thistle | كەرتەشیی، درکەماسیی، گیایەكی دەشتەكیی دڕكاوی‌یە لە زەویی بەیارو قەراغی رێگاێكاكاندا دەروێت، قەدەكەی لادارە. |
| خاما دريوس، جعدة طوقريون | Common germander | (جێرماندەر)،گیایەكی دەشتەكیی پزیشكی بە سوودە. |
| خاما، سوقي، تين الأرض | Crenated-annual-spurge | هەنجیری زەویی، گیایەكە لە كۆمەڵەی شیرمار، لقەكەی شیلەی تیایە، بەرەكەی لە هەنجیر دەچێت، گەڵا دەوری داوە، بۆ مەبەستی پزیشكیی باشە. |
| خامدريس جبلي | White-dryas | دریاسی سپیی، گیایەكە خشۆكە گوڵەكەی سپی‌یە. |
| خان، فندق | Inn, hotel, Caravansary | خان، كاروان، سەرا. |
| خانف، اخنف، اخن | Snuffer | منگن، ئەو كەسەی كە لە لووتەوە قسە دەكات. |
| خانق | Strangler, suffocator | خنكێنەر. |
| خانق، | Canyon | خەلەند، هەر شێوو دۆڵێكی قووڵ كە دیوارەكانی زۆر لێژ بووبن بەكاری ئاوی بە خوڕ. |
| خانق الكلب، خوشان، لحلاح | Dogs-bane Indian-hemp, Autumn-meadow-Saffron | ژەهری سەگ، خڕنووكە سەگانە، گوشی هیندیی، گیایەكی پزیشكی ژەهرە لە كۆمەڵەی ژاڵە، گەڵاو تۆوەكەی بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| خانق الكرسنة، جعفيل، حامول، اسد العدس، هالوك | Broomrape | گورگە، گیاكەڵە، رووەكێكی مشەخۆرە مادەی سەوزی (كلۆرۆفیل) تیادا نی‌یە خۆی دەنوسێنێت بە رەگی رووەكەكانی ترەوەو ئاوكەكەیان هەڵدەمژێت قەدەكەی سوور یان زەرد یان بنەوشەیی‌یە ئاوكەكەی بۆ مەبەستی پزیشكیی بۆ میزپێكردن باشە. |
| خانق الدجاج، خانق الديك، فربيون الشمس، عشبة الثالول، رمادة، لبنية، يتوع السحور | Sun-spurge, Weed-wort | گیا بالووكە، رووەكێكی شیراوداری پزیشكی‌یە گوایە شیراوی گەڵاكەی بالووكە لادەبات. |
| خانق الذباب | Dionaea, fly-trap Fly catcher | مێش گر، تەڵەی مێش، جۆرە گیایەكی دەشتەكی‌یە گوڵەكەی سپی‌یە، ئەگەر مێروو لەسەر گەڵاكەی بنیشێتەوە، گەڵاكەی دادەخرێت و مادەیەكی ترشیی دەردەدات و مێرووەكە دەكوژێت، دەیكات بە خۆراك و هەڵیدەمژێت. |
| خانق، الفهد، ارنيكا،، زهرة العطاس | Arnica, Leopards- bane | یۆزخنكێن، توتتەكێویلە، ژەهری یۆز، گوڵەپشەمین، جۆرە رووەكێكی گیایی دەشتەكی‌یە گوڵەكەی زەردە بۆ مەبەستی چارەكردنی وەرگەڕانی جومگە بەكاردێت. |
| خانق النمر، درنوق | Panther- Strangler | (ئۆرونیك)، ژەهری پڵنگ، گیایەكی ژەهریني سەلكدارە گوڵەكەی زەردە. |
| خانق الذئب، بيش | Aconite, Wolfs-bane | ژەهری گورگە، گورگ خنكێن، رووەكێكی دەشتەكیی ژەهرینە بۆ مەبەستی رازاندنەوەو پزیشكیی دەروێنرێت، گەڵاكەی لە گەڵا چنار دەچێت، گوڵەكەی ئەرخەوانی‌یەكی تێرە مادەیەكی ژەهرینی تیایە پێی دەوترێت(ئەكۆنتین). |

| | | |
|---|---|---|
| خانق | ChoKe | (چۆك)، كلافە تەلێكی كارەبایە لەسەر پارچە ئاسنێك هەڵ كراوە دەخرێتە بازنەی كارەباییەوە بۆ مەبەستی تەگەرە تێ خستنی رۆیشتنی تەوژمی كارەبا. |
| خانوق الدجاج أو الطيور | Pip, wolfs-Milk | چنچك، وەناقی مریشك، هەڵامەتی مریشك، نەخۆشییەكە لە نیشانەكانی ئەوەیە كە ئاوێكی لینج لە دەمیەوە دێتە دەرەوە. |
| خانوق، دفتريا، خناق | Diphtheria | (دیفتێریا)، وەناق، نەخۆشییەكی درمە. |
| خانملي، زهرة العسل، عسلية | Honey-Flower | پەنجەی خانم، گوڵە هەنگوین، دەوەنێكی پزیشكی و رازاندنەوەیە، گوڵەكەی بۆنخۆشە ئاوكێكی شیرینی هەیە بۆ چارەكردنی نەخۆشیی سنگ باشە. |
| خانة، عمود، حقل | Column | خانە. |
| خاو، خاوي | Empty, Vacous | بەتاڵ، بۆش، ڤاڵا. |
| خب، سعادي، سعد | Sedge | سەمل، گیایەكە بەسەر زەویدا دەخشێت، قەدەكەی لەژێر زەویدا دەنكی رەشی بۆنخۆشی پێوەیە دەكرێت بە ملوانكە. |
| خب | BarK, Epidermis | توێكڵی دەرەوەی قەدی درەخت ئەگەر تەڕو نیان بێت. |
| خباز | BaKer | نانەوا، نانكەر. |
| خبازة، اختباز | Panification, Bread-MaKing | نانەوایی، نان كەریی. |
| خبازة، خبازي، خبيزة | Cheese-weed, Mallow, Buttor, weed | تۆڵەكە، پەپكەملیچكانە، پەنیرە، گیادوگمە، جۆرە گیایەكە. |
| خبازي افرنجية،ابرة الراعي | Geranium | تۆڵەكەی ئەفرەنجی. |
| خبازي بستاني، خبازي اليهود، ملوخية | | تۆڵەكە جوولەكانە، ملوخیە.جۆرە گیایەكە. |
| خباطة، خلاطة | Mixer | مەكینەی تێكەڵ كردن، مەكینەی وەردینە، مەكینەی تێك هەڵدەر. |
| خباطة (خلاطة) البيض | Egg beater | مەكینەی شڵەقاندنی هێلكە. |
| خباء، مدقة | Carpel | كوتكی گوڵی روەك. |
| خباء، خيمة | Tent | خێوەت، چادر. |
| خبارة | Barrow of rat | كونەمشك. |
| خبال | Vesania | شێتیی، كەم عەقڵیی. |
| خبال | Trotter | وولاخی لۆقەكەر، ئەسپی لۆقەكەر. |
| خبب، خبب الحصان | Amble, Trot | نەرمەغار، لۆقە، یەرغە، لۆقەكردن، لۆقەی ولاخ. |
| خبث، شر، رداءة | Wickedness, Badness, Maligncy Malignancy | زۆڵێتیی، زبرە، خراپیی، پیسیی. |
| خبث | Slag | تڵپە، سەركەف، خڵتە، كەفی كانزا. |
| خبر، نبأ | Information | دەنگوباس، سەحوسیی، بنتار. |
| خبرة | Knowledge | شارەزایی،زانایی، پسپۆڕیی. |
| خبز، عيش | Bread | نان. |
| خبز | Panis | راجع (خبازه). |
| خبز المشايخ، سكع، زهرة المسيح، ولف، ركفة، بخور مريم | Sow-bread, cyclamen | سایكلامین، بخوری مریەم، نانەشێخانی گیایەكی سەلك دارە، بەرەكەی خڕو بچووكە، بۆ مەبەستی پزیشكی بەكار دێت. |

| | | |
|---|---|---|
| خبز الغراب، خبز القاق، طفلق، سرة الأرض، زلائف الملوك | Penny-wort, Toads tool | نانی قەلەڕەشکە، جۆرێکە لە قارچك پارچەی وەك کولێرە دەردەکات. |
| خبز للسفر | | نۆردوو، نانی نۆردو، نانی ڕێ ڤنگا. |
| خبز العسل | Honey-bread, bee-bread | نانەهەنگوین، تێکەڵاوێکە لە هەنگوین و تۆوی هەڵاڵە بە شێوەی خۆراك دەدرێت بە بێچووی کرمی ئاوریشم و هەنگ. |
| خبز محمص | Toast | (تۆست)، پەلەپیقە، نان یان سەموونی برژاو. |
| خبز المرقاق، خبز الدمكي، خبز رقاق | Thin bread (unleavened) | تیری، نانی تیریی، نانی تەنك. |
| خبز مقلي بالسمن | | نان ساجیی، ناوەشکێنە، ناوساجی، بچەك، نانشکێنە. |
| خبط، قرقعة | KnocK | تەقەتەق. |
| خبل | Tawny- owl | هوموکەرە، جۆرێکە لە کوندەبەبوو، سەری گەورەیە دەنووکی کورت و چەماوەیە، ڕەنگەکەی قاوەییە یان ڕەشە. |
| خبل، جنون | Insanity | شێتیی. |
| خبو | Todie-out | کزبوون. |
| خبو الصوت | Fading | کزبوونی دەنگ. |
| خبو الأشعاع الحراري | Decalescence | دامرکانەوەی تیشکی گەرمیی. |
| خبوش، اشرف | Vespertillo, Bat | جۆرێکە، لە شەمشەمەکوێرە |
| خبير | Expert | پسپۆڕ، شارەزا، بەڵەد، کارزان. |
| خبير بالمداواة | Therapist | پسپۆڕ لە چارەکردنی نەخۆشیدا. |
| خبيرة | | خوری باش، خوریی براوەی باش. |
| خبياري، كافيار، خوبيار | Caviare | (کافیار) گەرای ماسیی کە بۆ خواردن بەکاردەهێنرێت. |
| خبيزة | Marsh-mallow | تۆڵەکەی زەلکاو، گیایەکی دەشتەکیی و ڕازاندنەوەیە، ڕەگ و گەڵاو گوڵەکەی دەرمانی پزیشکی یان لێ دەردەهێنرێت. |
| خبيزة مخزنية، عضرس | White-mallow | تۆڵەکەی سپیی، جۆرێکە لە تۆڵەکە، لق و لاسکەکەی مووی پێوەیە، گوڵەکەی پەمبەییە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| خبيزة وردية، جوحم، سبت، شحم المروج | Rose-mallow, hollyhock | هێرۆ، تۆڵەکەی گوڵدار، جۆرێکە لە تۆڵەکە بەشێوەی هێشووە. |
| خبيص، خبيصة | Pudding Fried-egg | جۆرە حەڵوایەکە.هێلکەو ڕۆن، نیمرۆ. |
| خبيطة، فاشرا سوداء، عنب الحية | Snake-bryony | ترێ مارانە، گیایەکە لە کۆمەڵەی کولەکە گەلێك جۆری هەیە، توکاوی و بۆگەنە، گوڵەکەی مەیلەو سپییە، بەرەکەی لە ترێ دەچێت ڕەش و تاڵە، ڕەگەکەی دەرمانی لێ دەردەهێنرێت. |
| خبيث | Malignant | پیسیی، زیان بەخش. |
| ختان، ختانة، ختن | Circumcision posthetomy | خەتەنەکردن. |
| ختان | Circumciser | خەتەنەکەر. |
| ختامة، حبارة الختم | Stamped | ئیستەمپا، بۆ مۆرکردن. |
| ختاع، ختيعة | Finger-stall | پەنجەوانە، ژێگر، بەرگێکە دەکرێتە پەنجەوە بۆ پاراستنی. |

| | | |
|---|---|---|
| خترق، دمسيسة، شيح رومي، ابسنت، افسنتين | Absinthium | (ئەبسەنتین)، گیایەکی تەمەن درێژە گوڵەکەی لە بۆریی دەچێت بەشێوەی هێشووە، بۆنخۆشە بۆ مەبەستی پزیشکیی بەکاردێت. |
| ختعة | Tigress | بەوری مێ، مێیی بەور. |
| ختع | Young-hare | بەچکە کەروێشك، تێشکا کێرڤیشکی. |
| ختف، سذاب، فيجن | Rue | پێچن، روەکێکی پزیشکی‌یە گەڵاکەی سەوزێکی مەیلەو شین گوڵەکەی فستقی‌یە روەکێکی بۆگەنی تاڵو توونە، رۆنێکی لێ دەردەهێنرێت بۆ وریاکردنەوەی گەدەو هێنانە خوارەوەی تاو چارەکردنی کۆڵنجو کرمی ریخۆڵە. |
| ختم | Stamp, Seal | مۆر، ئیمزا. |
| ختم احمر، شمع احمر | Sealing-wax | لۆك، مۆری سوور. |
| ختمة، خطمي، خطمية | Marsh-mallow, ketmia, Alcea, Hollyhork | هەرمەڵە، هێرۆ، هێلوو، گیایەکی بەرزە گەڵاکەی پارچە پارچەیە قەدەکەی تووکنە گوڵی سپی‌و پەمبەیی گەورە دەگرێت. |
| ختمة شجرية، خطمي ملكي، خطمي سوري | Syrian-rose, Rose of sharon, shrub-althea | هێروی سوریی، هێرۆی درەخت، درەختێکە بۆ رازاندنەوە ، گوڵەکەی لە گوڵە هێرۆ دەچێت. |
| ختمة صينية | China-rose, Shoeflower | هێرۆی چینیی. |
| ختو، ابو نضوة، بوقير، البوقير | Hornbill | دەنووك شاخاوی، باڵندەیەکی دەنووك زلە شاخێکی کرکراگەیی وا بەسەری دەنووکی‌یەوە. |
| ختينن، مختون | Circumcized | خەتەنەکراو. |
| ختيعة، ختاع | Finger-stall | ژێگر، بخەوانە، لاستیکێکە ئەکرێتە پەنجەی بریندارەوە بۆ پارێزگاریی. |
| خنث، الغ، اشنة | Algae | قەوزە، کەڤز، روەکێکی سەرەتایی‌یە رەگو قەدو گەڵاکەی تیا دیار نی‌یە. |
| خث | Peat | پاشماوەی رووەکی رزیو وەکوو پاشماوەی قەوزە، رەنگەکەی قاوەیی‌یە بەسەر ئاوی زەلکاوەکانەوە دەبینرێت. |
| خثة، خثى | Cow-dung | شیاکە، پیسایی گاو مانگا. |
| خثارة اللبن المجفف اقط | Kishk | کەشك، دۆی خەستی وشك کراوە کە لەگەڵ ساوەردا دەکرێت بە چێشت. |
| خثارة | Curdle | دەڵەمە، لۆر، شتێکە لە پەنیر خاوترە،بەڵام نەمە پێنراوە. |
| خثرة | Lactic-yeast | هەوێنی ماست، بزرکاو،گرۆ. |
| خثرية | Electrocoagulation | مەیاندنی کارەبایی، مەیاندن بە کارەبا. |
| خثلة | Hypogastruim | بەرموسڵاڵن، نێوانی ناوكو بەر لەسەر سکی مرۆڤ. |
| خثماوات | Platyrrhiniens | مەیموونی لووت پان، کۆمەڵە مەیمونێکن لووتیان پانە. |
| خثم، ختم | Macrorhinia | لووت زلیی، لووت پانی. |
| خثورة، قشطة، قشدة | Cream | سەرتوێژ، سەرتوێك. |
| خجل | Shyness | شەرمەزاریی، شەرم کردن، تەریق بوونەوە، شەرم، تەریقی، فەمێت. |
| خجلان، خجول | Shy, Ashamed | شەرمن، بێ روو، تەریق. |
| خد | CheeK | روومەت، گۆنا، کوڵم، گوپ، لام، ئەلیك. |
| خد البنت، ايا بانة | Hemp-agrimony Ayapana, Waterhemp | ئەیاپانە، رووەمەتی کچ، گوڵە مرواریی، رووەکێکە لە ناوچە گەرمەکاندا دەروێت گەڵاکانی بۆ دەرمان بەکار دەهێنرێت بۆ بەهێزکردنی گەدەو ئارەقکردنەوە وەکوو چایی‌و قاوە لێ دەنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| خد العذراء | Buttercup, Turban | گوڵاڵە سوورە، گوڵەنیسان، گوڵە مێلاقە، گیایەکی دەشتەکییە، گوڵێکی هەمە جۆرە دەگرێت لە سەرەتای بەهاردا پەیدا دەبێت. |
| خداج | Premature, birth, Labor-premature | نەبەکامیی، ئەومیە کە مێیینە بزێت، بەر لەماوەی تایبەتیی خۆی. |
| خداع | Charlatan , Deceiver | ساختەچی، فێڵ باز، تەڵەکەباز. گزیی کەر. |
| خداعة الرجال، افیون | Opium, poppy | بەنگ، شلەیەکی سەرخۆشکەرە. |
| خداش، علیق، عوسج | Black-berry Common-bramble | توترك، تودرك، دەوەنێکی دڕکاوییە لقەکەی شۆڕدەبێتەوە، بەرەکەی لە توو دەچێت سوورو رەشە دەخورێت. |
| خدر،خدار | Anaesthesia Numbness | جەمام بوون، بێ هۆش بوون، سڕی، سڕبوون. |
| خدر | Num | جەمام، سڕ، تەزیو. |
| خدر بسبب الدواء | Norcosis | بێهۆشبوون، بە هۆی دەرمانەوە. |
| خدرنق | Tarantula | کەرمجنە، جۆرێکە لە جاڵجاڵۆکە تووکنو رەنگ زەردو ژەهرینە. |
| خدران، مخدر | Benumbed | تەزیو، سڕ، جەمام. |
| خدروس | Kedrostis | (کیدروستیس)، گیایەکی دەشتەکیی پزیشکییە لە کۆمەڵەی کولەکە. |
| خدریة، رصن، رجل الذئب | | چڕنووکی گورگ، گیایەکی پزیشکییە تۆزێکی زەردی لێ دەگیرێت بۆ مەبەستی پزیشکیو دەرمان. |
| خدش | Abrasion scratch | رووشان، رنین، روو شاویی،رووشاندن، خوراندن، خرموشك. |
| خدع، خدعة، خديعة | Deceit, Trick, Delusion | فریو، فریواندن، هەڵ فریواندن، فێڵ کردن، خەڵەتاندن، گزیی، تەڵەکەبازیی، چەواشەکردن، ساختەچێتی، چاوبەست، پەند، پەنگ، لاس دان، تەفرەدان. |
| خدعة بصرية | Optical-illusion | چاوڕێشکەکردن، ریشکەوپێشکەی چاو. |
| خدل | Obdormition | سڕبوون ، تەزین، سڕبوونی ئەندامێك لە ئەنجامی ئەوەی کە بەسەریدا بکەوێت. |
| خدمة، عمل | Service | خزمەت، راژە. |
| خدوش، خنفساء برغوثية | Flea-Beetle | قالۆنچە کێچیی، جۆرە قالۆنچەیەکە. |
| خديج، سقط، مليص | Precocious, birth Abortus | نەبەکام، حەوت مانگە، منداڵێك بەر لە کاتی خۆی لە دایك بووبێت. |
| خذاق، حبار، سبيدج | Cuttle-Fish, Sepia | (سیپیا)، مەرەکەب وەشێن، گیاندارێکی دەریایی نەرمە، مادەیەکی رەش یان قاوەییی تۆخ دەردەداتە ئاوەکەوە لە کاتی نزیك بوونەوەی دوژمندا بۆ ئەوەی خۆی لێ بشارێتەوە. |
| خذروفة | Blast | (بلاست)، جۆرە کەڕوویەکی زیان بەخشە لە روەك دەدات. |
| خذروف | Humming-top | مزراح، خول خولۆکە، فرفرۆکە. |
| خذعة | Slice | |
| خذف، زناد | Hummer, CocK | پەلەپیتکە، ئامرازێکە، لە تفەنگو دەمانچەدا کە پنجەی دەخرێتە سەر دەتەقێت. |
| خذف، ذرق، سلح | Mute | ریقنەی باڵندە. |
| خذل | Paresis | خاوبوونەوەی ماسولکە. |
| خذواء (اذن) | Ear-flap | گوێچکەی گەورەی شۆڕ وەکوو هێنی مەڕ. |
| خذيعة | Meat-balls | شفتە،کفتە، جۆرە خواردەمەنییەکە. |
| خر | Boitard | کونی دەستاڕ، کە دانەوێڵەکەی تێ دەکرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| خرء، خراء، غائط | Excrement, Ordure, Feces | گوو، سل، پیسایی، ڕیخ. |
| خرء النحل | Bee- feces | پامێزە، گووی هەنگ. |
| خرء العصافير، حرض ابيض | White-Saltwort | ئەسپۆنی سپیی، گیایەکە لە خۆڵەمێشەکەی قلیە دەردەهێنرێت. |
| خراج، خراجة، دمل | Abscess, Tumour | ئاشێن، ڕیشك، قونێر، کونێر، دوومەڵ. |
| خراعة، خراعة حضرة، فزاعة | Scarecrow | بووکەدارینە، داهۆڵ، داورە، داوڵ، جاتوڵ. |
| خراع | Tabesdorsalis | خاوبوون، بێهێزی جومگەی لەش. |
| خراطة، خرط | Turnery | خەراتیی، خەرت، ڕێکخستن، وردکردن، تۆرنەچێتیی. |
| خراطة، قراطة | Chopping-Knife | چەقۆی خەراتیی. |
| خراطة، خراطة معدن، برادة معدن | Filings | خاکە، وردە، وردتکە، برادە، وردەی کانزا، وەکوو خاکەی ئاسن. |
| خراط | Turner | خەرات، تۆرنەچیی، ئەو کەسەی کە خەراتیی دەکات. |
| خرابة، خرائب، خرامة، | Ruins perforator, | کەلاوە، وێرانە، کاول، کاڤل. |
| مثقب | Drill, punch | ١-ئامرازێکی ئەلیکترۆنییە بۆ لەحیم کردن.<br>٢-سمۆ، ئامرازێکە بۆ کونکردن. |
| خرافة | Superstit:on | پڕوپوچ، ئەفسانە. |
| خراج الكبد | Hopatic-abscess Hepatophyma | دوومەڵی جگەر، پەیدابوونی دومەڵوکێم لە جگەردا بە هۆی میکرۆبەوە بە زۆری هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ توشبوونی زەحیریی لەوەپێش. |
| خراج اللثة | Parulis | دوومەڵی پووك. |
| خراج، ضريبة | Tax- Tribute | باج. |
| خراز، خرزي | Beads-seller | مووروفرۆش، هەڵمات فرۆش. |
| خرام، اسطر اطيقوس | Sea-star- wort | گیا ئەستێرەی دەریا، گیایەکە لە شوێنی شێداردا، دەڕوێت بۆ مەبەستی پزیشکیی و ڕازاندنەوەی باخچەکان دەڕوێنرێت. |
| خراعة، كساح | Rickets, rachitis | گێڕیی، نەرمی ئێسك، ئێسکە نەرمە، نەخۆشییەکە دەدات لە ئێسقان ئارێکی دەدات. |
| خربق | Helle bore | خەرپونگ، خەربەنگ، خەربەند، ڕوەکێکی دەشتەکیی دەگمەنە، گوڵەکەی سەوزە قەراغی گوڵەکەی سوورە مادەیەکی ژەهری تیایە پێی دەوترێت (هیلیبۆرین) دووکەڵی تۆوە سوتێنراوەکەی بۆ قلیشاویی ئەندام باشە. |
| خربق اسود | Black Hellebore | خەرپوونگی ڕەش، ڕووەکێکی هەمیشە سەوزی ژەهرینە بۆ مەبەستی پزیشکیی بەکاردێت، لە زستاندا گوڵ دەکات. |
| خرباق | Eranthis, Winter-helle bore | خەربەنگی زستانە، گیایەکی دەشتەکییە دەرمانی پزیشکی لە ڕەگەکەی دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی ئاژەڵ. |
| خربوق | Veratrum | ڕوەکێکی گیاییە لە کزمەڵەی زەمەق قەدی ژێر زەوی هەیە گەڵاکەی گەورەیە گوڵەکەی بچووکە جورێکی هەیە گوڵەکەی سپییە دەرمانی ئاو بڕینی لێدەردەهێنرێت. |
| خربقين | Helleborin | (هیلیبۆرین)، مادەیەکی ژەهرە لە ڕەگی خەرپۆنگ دەردەهێنرێت بۆ ڕەوانکردن و بەهێزکردنی دڵ بەکاردێت. |
| خريز، دلاع، رقي، بطيخ احمر | Water-melon | شووتی، شفتیی. |

| | | |
|---|---|---|
| خرتيت، كردكدن، وحيد القرن، حرميس | Rhinoceros | کەرکەدەن. یەکشاخە. گیاندارێکی شیرەدەری سەداری کەتەیە، پەلەکانی کورتن هەر یەکەی سێ پەنجەی پێوەیە. پێستەکەی ئەستوورە یان شاخێك یان دوو شاخی کورت‌و درێژی هەیە لە نزیك ئاودا دەژی لق‌و گەڵاکەی درەخت دەخوات لە ئاسیاو ئەفریقیادا دەژی. |
| خرت، خرم، ثقب | Hole, forage | کون. |
| خرثامة | Reddish-ant | مێروولەی سوور. |
| خرج | Bag, saddle | خورج، هەگبە، خورجین، پاشکۆ. |
| خرخرة، حشرجة | Snoring | مرخەمرخ، خڕەخڕ، پڕخەپڕخ خیزەخیز. |
| خرخفتي، غرغاج، دردار حقلي | English-elm | دارەڕەشی ئینگلیزیی، قەرەقاج، درەختێکی بەرزە ئاوکی گەڵاکەی بۆ پاکژکردنەوەی برین‌و چاو بەکاردێت. |
| خردق، رش الصيد | Shot, Small- shot | ساچمە، وردە پارچەی قورقوشمە لەناو قەباغی فیشەکدا بە تفەنگ باڵندەی پێ دەکوژرێت. |
| خردل ابيض، اسفند | White Mustard | ئەسفەند، قانگ، ئەسپەند، خەرتەلەی سپیی، رووەکێکە گوڵەکەی زەردە هەندێك جۆری بۆ لەوەڕو هەندێکی بەشێوەی پەین بەکاردێت. |
| خردل بلدي، كبر | Indian-mustard | خەرتەلەی هیندیی، رووەکێکی توونە. |
| خردل بري | Wild-mustard, Field-Kale | خەرتەلە کێویلە، گیایەکە گوڵەکەی زەردە، رەشە لەناو گەنم‌و جۆدا دەڕوێت. |
| خردل | Mustard, Charlock | خەرتەلە، خەردالە، گۆرمزە، ترەوکە، ئاهووریی، رووەکێکی بەهارییە رەگێکی مێخیی کەمێك ئەستووریی هەیە قەدێکی قنجی هەیە گوڵێکی زەرد دەگرێت، دەکرێتە زەڵاتەوە تامی لە تامی توور دەچێت‌و بەرەکەی رەش‌و وردە دەکرێت بە بەهارات هەروەها جۆرە رۆنێکی لێ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکیی. |
| خردة | Scrap | سکراپ،وردە شتوومەکی کۆن. |
| خردجي | Haberdasher | دەستگێڕ، چەرچی. |
| خردوات | Small-wares, haberdashery, hardware | وردەواڵە، وەردەواڵا، وردەشتی ناوماڵ، شتی وردە. |
| خردلة، خردلية | Siliqua | خەرتەلەیی، بەرێکی وشکی لاکێشەیییە لە بەری فاسۆلیا دەچێت، دوو پارچەیە دیوارێك لە نێوانیاندا هەیە. |
| خردل اسود | Black-mustard | خەرتەلەی رەش، گیایەکە لەناو کێڵگەی گەنمدا دەڕوێت گەڵاکەی ددانداره، گوڵەکەی بەشێوەی هێشووی زەردە، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| خرز، خرزة البوراكس | Borax-bead | موورووی بۆراکس، کاتێك کەمادەی بۆراکس لەسەر ئاگر دەتوێنرێتەوە مادەیەکی شووشەیی روون پەیدا دەبێت، ئەم مادە شلە ئۆکسایدی میتاڵەکان (کانزاکان) لە خۆیا دەتوێنێتەوەو رەنگێکی تایبەتیی پەیدا دەبێت ئەو میتاڵەی پێ دەناسرێتەوە. |
| خرزة، فقرة | Vertebra | بڕبڕەی پشت، پارچە ئێسکێکی خڕی چوکڵەداری کوناودەرە، مووڕەغەی پشتی لێ پێکدێت. |
| خرز الصخور | Island-lichen | موورووی بەرد، جۆرە رووەکێکە بێ گوڵ‌و بێ گەڵایە، بەشی سەرەوەی سەوزەو خوارەوەی سپی یان بۆرە پەلکدارو رەقە وەك کڕکڕاگە وایە بۆ دەرمانی کۆکەو نەخۆشیی شەکر بەکاردێت. |
| خرز بنت الفلاح | Cow-herb | گیامانگا،جۆرە گیایەکە. |

| | | |
|---|---|---|
| خرس | Mutism | لاڵیی، لاڵ بوون، بێ زمانیی، گەی گرتن. |
| خرس، حبسة | Aphasia | نەتوانینی قسەکردن. |
| خرس، بور | Fallow-land | زەویی بەیار، زەوییەك کە بەبێ چاندن بەجێ هێڵرابێت. |
| خرسانة | Concrete | (کۆنکرێت)، تێکەڵاوی لم و چەو و چیمەنتۆ بۆ خانو و پرد دروست کردن. |
| خرسانة مسلحة، کونکریت مسلح | Reinforced Concrete | کۆنکرێتیی شیش بەند. |
| خرش | Scratch | رنین، دارنین، رووشاندن. |
| خرشة | Fruit-Fly | مێشی میوە، جۆرە مێشێکی زیان بەخشە بە رووەك. |
| خرشقلي، بلطي، مشط | Bulti | (بولتی)، جۆرە ماسی‌یەکی دەریایی و رووباریی مام ناوەندیی‌یە هەندێکی رەنگەکەی بۆرەو هەندێکی مەیلەو قاوەیی‌یە. |
| خرشنة، خطاف البحر | Tern | پەرەسێلکەی دەریا، باڵندەیەکی ئاوی‌یە لە قاقڵی بازان(نەورس) دەچێت رەنگەکەی بەڵەکە. |
| خرشوف، خرشف، ارض شوکي | Artichoke | کەرتەش، شەکرۆکە،، رووەکێکی دەشتەکیی و کشتوکاڵیی دڕکاوی‌یە گوڵەکەی مۆرە دەخورێت. |
| خرص، سعف | Palm-leaf | گەڵای دارخورما. |
| خرط | Prairie-chicken | قەتێی ئەمریکیی، باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی قەتێ دوو تۆپەڵ پەڕی نەرم وان بەژێر ملی‌یەوە رەنگی رەش و سپیی و بۆرو سووری هەیە. |
| خرط | | نەخۆشی‌یەکە تووشی گوانی ئاژەڵ دەبێت و شیرەکەی گرۆگرۆ دێتە دەرەوە. |
| خرط، خراطة | Turnery | خەرت، خەراتی، دروستکردنی شتوومەك لە دارو کانزا. |
| خرطوشة | Cartridge | گوللە، فیشەك. |
| خرطوميات | Proboscida | گیاندارە قورتم دارەکان وەکوو فیل. |
| خرطوم المَياه | Hose | سۆندەی ئاو، لاستیکی ئاو. |
| خرطوم | Trunk, proboscis | لمۆز، قورتم، کەپوو. |
| خرطال، شوفان، هرطمان، دوسر، قرطمان، خافور، زمير، جادوار | Rye, Oats | کاڵتاس، هەرزن، گیابریشیی، گەڵاریشیی، رووەکێکە لە کۆمەڵەی دەغڵودان دەکرێت بە ئالیك لە هەندێك شوێن دەیکوڵێنن و ئاوەکەی دەخۆنەوە. |
| خرطون، أبو مديد، حبليل، دودة الطين، شحمة الأرض | Earth-worm, angle worm | گڵ خۆرکە، کرمی ناو زەوی، کرمێکی درێژی ئەڵقە ئەڵقەی سوورە بەژێر زەویدا دەڕوات سوودی هەیە بۆ کشتوکاڵ چونکە زەوی‌یەکەی هەڵدەگێڕێتەوە. |
| خرطيط | Ermin-moth | (مۆرانەی ئیرمین)، پەپوولەیەکی زیانبەخشە بە رووەك. |
| خرعب، خرعوب | Transplant, Yearly-bough | چووز، نەمام. |
| خرغوس | Caltha | (کالثا) رووەکێکە گوڵەکەی زەردەلەگوڵاڵە دەچێت. |
| خرف | Dotage, Dementia | خەڵەفاویی، خەرەفاویی، خڵەفاویی، خەرەفان. |
| خرف | Dotard | خەڵەفاو. |
| خرفش، حجر خفاف | Pumice | بەردەپێ‌جۆرە، بەردێکی کون کونی سووکە بڵقی تیایە. |
| خرفع | Old Cotton | لۆکەی کۆن. |
| خرفق اندلسية عطرة | Candytuft | ئەندەلوسیی، دەوەنێکە گوڵی هەمە جۆرە دەگرێت بەتایبەتیی سپیی. |
| خرفق خردل فارسي، حشيشة السلطان | Karadamon, , Water-cress | خەرتەلەی فارسیی یان تەڕەتیزە. |

| | | |
|---|---|---|
| خواني، ريش الخواني | Secondaries-Coverts | ئەو پەڕە گەورانەن کە ولن بەسەر باڵی باڵندەوە ژمارەیان ١٠-٢٠ پەڕە. |
| خوان | Eating table | مێزی نان خواردن، خوان، سفرە. |
| خوخ، دراق، دراقن | Prune, peach | شەفتالوو، قۆخ، هەشتالوو، شەفت بوو. |
| خوخ بري، برقوق، خوخ السياج | Wild-prune | هەڵوژە کێویلە، هەڵوژە رەشە، قۆخە کێویلە، درەختێکی دڕکاوییە، گوڵەکەی سپیی بەرەکەی خڕوڕەنگەکەی شینی مەیلەو رەشە. |
| خوخ ملابار، تفاح الورد، جنبوزة | Malabar-plum, Rose-apple, Jambosa | قۆخی مالابار، درەختێکی بچووکە لە کۆمەڵەی مورد گوڵەکەی گەورەو جوانە بەرەکەی سوورو بۆن خۆشە بە قەدەر سێوێك دەبێت خۆشە دەخورێت و ئاوەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| خوذة معدنية | Helmet | کڵاوی ئاسنین،کڵاوزرێ ، تاسکڵاو. |
| خور | Prostration | لەش داهێزران. |
| خور، نورستانيا | Neurasthenia | بێهێزی دەمار، پشێویی فرمانی لەش و هەستکردن بە ماندوێتیی. |
| خور | Gorge, embouchure | کەندر، خەلەند، رێژگە. |
| خوري، شماس، ابو قلنسوة | Black-cap | کڵاورەشە، جورە بازاڕی، جۆرە باڵندەیەکی کڵاو رەشە لە بولبول دەچێت حەز لە هەنجیر دەکات. |
| خورنق، سيدا | Alpinia, GreeK-mallow | ( ئەلپینیا)، تۆڵەکەی گریکیی، گیایەکە یان دەوەنێکە گوڵی سوور دەگرێت بۆ مەبەستی پزیشکی و رازاندنەوە دەڕوێنرێت. |
| خوريا وبائية، مرض الرقص السنجي، كوريا، رقاص. زفن | Chorea | (کۆریا)، (خۆریا) جۆرە نەخۆشییەکی درمی دەمارییە، نەخۆشەکە دەم و چاو پەلەکانی دەلەرزێت. |
| خورمة، ارنبة | Narium-septum, Nose-lobule-Tip of the Nose | دیواری نێوانی دوو کوونە لووت کۆڵەکەی لووت. |
| خوزب | Udder-swelling | سووتانەوەی گوان، ئاوسان و سووتانەوەی گوانی ئاژەڵ. |
| خوشان، خانق الكلب | indian- hemp | سەك خنکێن، جۆرە رووەکێکی پزیشکییە لە کۆمەڵەی ژاڵە بەرەکەی باریکە تۆوەکەی وردە، دەرمانی رەوانیی و رشاندنەوە لە گەڵاو تۆوەکەی دەردەهێنرێت ، ریشاڵی لقەکانی وەکوو گوش بەکاردەهێنرێت. |
| خوص، خوص الأجفان، غؤرو العين | Mole-eyed enophtalmia | ١-چاو بە قوڵاچوون، چاوبچووکیی، نووسانی پێڵوو، بە گلێنەی چاوەوە.<br>٢-جیاوازی رەنگی چاوی گیاندارێك لە رەنگی چاوەکەی تری وەکوو لە ئەسپدا. |
| خوص، سعف النخل | Palm-leaves, fronds | گەڵای دارخورما. |
| خوض | Wading , Fording | چوونە ئاوەوە، بە ئاواڕۆیشتن. |
| خوف | Fear | ترس، باك، پەروا، ترسان، سام، پاج. |
| خوف المرض | Nosomania | ترسان لە نەخۆشیی. |
| خوق | Phtiriose | (فتیریۆس)، نەخۆشیی دارمێو، نەخۆشییەکی رووەکییە. |
| خولان، عرقد، حضض | Lycium-arabicum | دڕکی دێو،چالووك،دەوەنێکە لقەکەی دڕکاوییە بۆ پەرژین باشە،گوڵەکەی سپی و مەیلەو پەمبەییە، بەرێکی سووری هەیە لە ترێ دەچێت. |
| خولة | Gazelle | ئاسك، مامز. |
| خولي، شنقب، جهلول، شكب، بكاسين | Snipe | (سنایپ) جۆرە باڵندەیەکی بچووکی دەنووك درێژە رەنگەکەی قاوەییی پنکە پنکەیە. |
| خولي الرز، أبو اليسر | Pratincole | (پراتینکۆل)، جۆرە باڵندەیەکە لە پەرەسێلکە دەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| خولنجان | Galangal, Alpinia, Siamses-ginger | زەنجەفیلی سیام، گیایەکی دەشتەکی‌یە گوڵی سپیی دەگرێت لە کۆمەڵەی زەنجەفیلە، قەدی ژێر زەویی هەیە بۆ مەبەستی پزیشکیی و رازاندنەوە دەروێنرێت. |
| خومع،صیدن ازرق | Blue Fly | جۆرە مێشێکی شینە بە گۆشتەوە دەنیشێتەوە. |
| خویط | Filament, Fillet | دلو، دەزوولە، دەزوولەی ئەندامی نێرەکی گوڵی روەك. |
| خیار، قثد | Cucumber | ئاروو، خەیار، هاروێ. |
| خیار شنبر، خرنوب هندي، خیار شمبر | Cassia-fistula, pudding-pipe-tree Negro coffee purging-cassia | خەیار چەمەر، روەکێکی ناوچە گەرمەکانە بەرەکەی لوولەیی و درێژە لە خەیار دەچێت دەنکەکەی سوورە دەرمانی رەوانیی لێ دەردەهێنرێت. |
| خیار البحر | Sea- cucumber | خەیاری دەریا، گیانداری دەریایی‌یە پێستەکەی درکاوی‌یە لە خەیار دەچێت. |
| خیار بري | Wild-cucumber, Bitter-root | خەیارە کێویلە، گیایەکی دەشتەکی‌یە بەرەکەی بچووك و سوورە ناخورێت. |
| خیار مندیرا | Cucumber-of- mandira | خەیاری ماندیرا،گیایەکە لە کۆمەڵەی کولەکە بەرەکەی هێلکەیی و سەوزی مەیلەو زەردە دەکرێتە ترشیاتەوە. |
| خیار طویل، خیار مائي | Gerkin | ترۆزیی، شارۆخ. |
| خیار افرنجي، سکیوم، کوسی افرنجي | Chayote | (چایوت)، خەیاری ئەفرەنجی، رووەکێکە لە کۆمەڵەی کوولەکە رەگەکەی سەلك دارە، گوڵەکەی زەردە بەرەکەی گەورەو هێلکەیی‌یە دەکرێت بە چێشت، سەلکەکەی وەکوو پەتاتە بەکاردێت. |
| خیاط، ترزي | Tailor | بەرگ درو، شوونك، خەیات. |
| خیاطة | Sewing, tailoring, suture | دروون،، دروومان، دوورمان. |
| خیال | Imagination, Fancy, Silhouette, Image | ئەندێشە، تارمایی، سێبەر. |
| خیالي، تصویري | Imaginary, imaginative | ئەندێشەیی. |
| خیال لماتة، مجدار، فزاعة | Scare-crow | داهۆڵ، دلورە. |
| خیال، خیالة، فارس | Cavalry, Horse man | سوار، سوارە. |
| خیال، طیف | Spectre | تارمایی، شەبەنگ. |
| خیبة، فشل | Disapointment | ناکامیی،، نائومێدیی، سەرنەکەوتن، دڵساردیی. |
| خیتون، جیتون، کیتون | Chiton | جۆرێکە لە شەیتانۆکە، قاقڵە جنۆکە. |
| خیتة | | رووەکێکە دەرمانی چوك بەهێزکردنی لێ دەردەهێنرێت. |
| خیتحور، قمص | Water-Skipper | ئاو رۆشنکەرەوە، جۆرە مێرووەیەکە لەناو ئاودا دەسوڕێتەوە. |
| حیثمة، انثى الببر | Tigress | بەوری مێ، مێی بەور. |
| خید، فصلصة | Lucerne | سێ پەرە، گیایەکە گەڵاکەی سێ پەلکە بۆ لەوەڕ باشە. |
| خیدع، خیطل، قط، هر، هرس، بس، سنار، سنور، دمة، مخدش،ابو غزوان | Cat | پشیلە،کتك، گوریە. |
| خیرابو،، خیربوا، هیل بوا | Lesser, Cardamom, Meleguetta-pepper | هێل، حێل، قاخلی، کاژیلە،، هێلی دەنك ورد، بەری جۆرە رووەکێکە بۆ ورياکردنەوەو مێزکردن بەکار دەهێنرێت. |
| خیرالله، حلبلاب، مستدیر الورق | Thorow-wax | خێری خوا، رووەکێکی پزیشکی‌یە دەرمانی ئازاری سنگ و کۆکەی لێ دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| خير جل، التهاب الغدد المعاوية | Bubo | خەیارە، ئاوسانی لووی لەش، ئاوسانی لووی پەنا ڕان. |
| خيري، منثور | Garden-Stock | شەوبۆ، گوڵە چاوئێشە. |
| خيزران، زند العروس، | Bamboo, | خەیزەران، تەرکەن، دارسیواك، خەلیلە، خەڵتانە، ئەرج، داری ددان ئاژنین، لقەکانی دەکرێت بە گۆچان. |
| جنهي، خلة، غاب فارسي، غاب هندي | Khella pick-tooth | |
| خيزقة،، خشناء | Sea-Mallow | تولەکەی دەریا، گیایەکە گوڵی پەمبەیی یان بنەوشەیی دەگرێت. |
| خيش | Hessian | گوش، کلت، گوێنیی، جۆرێکی زبرە لە کەتان. |
| خيشوم، غلصم | Gill Branchia | کەپوو، خەرنانە، برناخ، کەوانەی ڕیشەدار، ئەندامێکە لە ماسیدا هەیە بۆ هەناسەدان لەناو ئاودا. |
| خيشوميات | Branchiates | گیاندارە کەوانە ڕیشەدارەکان وەك قرژاڵ. |
| خيط، خيط الأبرة | Filament, Thread | دەزوو، پەرگ، هەودا، تاو، داو ، ڕیس بەن، تاڵ، مەچیر. |
| خيط مشمع | Waxen-thread | زیگ، دەزووی شەماویی، دەزووی مۆماویی. |
| خيط الأح | Chalaza | (کلازا)، ئەو دەزولەیەیە کە لە سپێنەی هێلکەدایە. |
| خيط خيشومي | Branchial Filament | دەزوولەی کەوانەی ڕیشەدار، ئەو بەشە دەزوولەیییانەیە کە بۆری مۆیینی خوێنی زۆر تیادایەو ئاڵوگۆڕی گازەکانی تیادا ڕوودەدات لە کەوانەی ڕیشەداری ماسیدا. |
| خيطي الشكل | Filiform | شێوە دەزوولەیی. |
| خيطيات، ديدان خيطية | Nemathelminthes | کرمە دەزوولەییەکان ، زۆربەیان مشەخۆرن وەکوو کرمی ئەسکارس لە ڕیخۆڵەی مرۆڤدا دەژی. |
| خيط صوفي | Wollen-thread | بەن، دەزووی خوریی. |
| خيط عصبي، محور الخلية العصبية | Nerve- fiber | ڕیشاڵی دەمار، تەوەرەی خانەی دەماریی. |
| خيطل، سنور، هر، قط، خيدع | Cat | پشیلە، کتك، گوربە. |
| خيف | | بە یەکێك دەوترێت کە هەردوو چاوی ڕەنگیان جیاواز بێت بۆ نموونە سەوز و ڕەش. |
| خيف | Scabbard | پێستی گون، پێستی گوانی ئاژەڵ. |
| خيفانة | Locust | کوللە،کولیی. |
| خيل، خيول | Horses | چارەوا، وڵاخ، بەرزەوڵاخ، وەکوو ماین و ئەسپ. |
| خيلان، اطوم، ابنة البحر، عروسة البحر | Dugong, halicore, Mermaid | کچی دەریا، کەنیشکی دەریا، بووکی دەریا، گیاندارێکی شیردەری گیاخۆرە شێوەی سەری لە سەری ئادەمیزاد دەچێت، کلکی لە کلکی نەهەنگ دەچێت، دوو دەستی هەیە لە پەرەکەی ماسی دەچن، تەوژمێکی کارەبایی دەدات لە کاتی مەترسیدا. |
| خيلانيات | Sirenia | (سیرینیا)، کۆمەڵە گیاندارێکی شیردەری دەریایی گیاخۆرە لە نەهەنگ دەچن وەکوو مەری دەریاو کێچی دەریا. |
| خيليات، خيول | Equidae | وڵاخ، چارەوا، چارەوێ، کۆمەڵە گیاندارێکی یەك سمە وەکوو ئەسپ و ئێسترو کەر. |
| خيمة | Tent | چادر، دەوار، خێوەت، هەواریی، سەیوان،ڕەشماڵ، سیاماڵ، کۆماچ، تاوڵ. |
| خيميات | Umbelliferae | چەترییەکان، چەتردارەکان،کۆمەڵە ڕووەکێکە ڕژێمی گوڵ کردنەکەیان وەك چەتر وایە وەکوو گێزەرو گژنیژو زیرە. |

| | | |
|---|---|---|
| خيوط مغزلية | Contractile-Fiber | دەزوولە تەشيلەييەكان، ريشاڵە كرژەوەبووەكان، چەند دەزوولەيەكن لەشێوەی تەشيلەدا لە خانەی لەشی زيندەوەردا پەيدا دەبن فرمانێكی تايبەتی‌يان هەيە لە كاتی دابەشبوونی خانەكەدا. |
| خيول السباق | Race-horses | ئەسپی رايسز، ئەسپی غارغارێن. |
| خيول العربات | coach horses | ئەسپی گاليسكە. |
| خيول الجر | Carriage-horses | ئەسپی راكێشان، بارگير. |
| خيول الركوب،جياد | Saddle-horses | ئەسپی سواريی، ئەسپی سواربوون. |
| خيول النزو | Stallion-blood-Horses | ئەسپی پەڕين، ئاسپی ئاوس كردن. |

| | | |
|---|---|---|
| داء، مرض، وصم | Maldy, illness disease Affection | نەخۆشیی،دەرد. |
| داء الصدف، صداف | Psoriasis | (سوریاسیس) نەخۆشیی توێژ فڕێدان، وشکبوونەوەو هەڵقرچانی پێست. |
| داء الفیل | Elephantiasis Arabum, Barbadoes-leg, Buoknemia buchemia-tropica, Cochinleg | پێ خڕە، پاگڕە، نەخۆشی لاق و پێ، ئەستووربوون لە ئەنجامی لێ پیسکردنی تووشبوون بە کرمی فیلاریاوە پەیدا دەبێت، کە لاق و پێی نەخۆشەکە وەکوو هێنی فیلی لێدێت. |
| داء الفقاع | Pemphigus | نەخۆشی بڵق، نەخۆشییەکە لە نیشانەکانی پەیدابوونیی بڵقە لەسەر پێست لەگەڵ خرو و ئازارێکی کەم، جاری وا هەیە دەمی بڵقەکە بە قەدەر دەنکە نۆکێکی لێدێت. |
| داء الثبوت، داء الشخوص، داء الجمود | | نەخۆشیی حەپەسان، نەخۆشییەکی دەمارییە، نەخۆشەکە دەستەڵاتی خۆی ون دەکات و ماسولکەکانی رەق دەبن. |
| داء السکر، البول السکري | Diabetes-mellitus, Glycosuria | نەخۆشی شەکر، پتربوونی رادەی شەکر لە خوێن و لە میزدلو، کەم بوونەوەی کێشی مرۆڤ و تینوێتییەکی زۆری لە گەڵدا دەبێت. |
| داء السمك، سماك | Ich thyosis | نەخۆشیی ماسیی، نەخۆشییەکی زکماکییە لە نیشانەکانی ئەوەیە کە پێست زبر دەبێت. |
| داء نباتي | Phytonosis | نەخۆشیی رووەکیی. |
| داء المصبع | Frambesia | نەخۆشییەکە لە فەرەنگیی دەچێت لە ناوچە گەرمەکاندا بڵاو دەبێتەوە. |
| داء الکلب، رهبة الماء | Hydrophobia, rables | هاریی، سەگەناز. نەخۆشییەکی درمە لە سەگی هارەوە دادەکەوێت. |
| داء المفاصل، داء الملوك، نقرس | Arthritis, Gout, podagra | نەخۆشیی شاکان، نەخۆشیی جمگەو پەنجە گەورەی پێ. |
| داء الحمراء، النار الفارسیة | Erysipelas | بای سوور، سوورەبا، بریتییە لە سووتانەوەی پێست. |
| داء الصنادید | | پاڵوو، نەخۆشییەکە تووشی پەردەی سیی دەبێت. |
| داء الاظافر | Ony chosis | نەخۆشیی نینۆك. |
| داء الحفر، أسقربوط | Scurvy | ئەسکەرپووت، نەخۆشییەکە لە نیشانەکانی ئاوسان و خوێن بەربوونە لە پوکدا. |
| داء الفطر الشعاعي | Actinomycosis | نەخۆشییەکە برین لەناو دەمی ئاژەڵدا پەیدا دەکات. |
| داء الثعلب، ثعلبة | Alopcia | مووڕزە، نەخۆشیی ڕێوی، وەرینی تووك، تووك هەڵوەرین. |
| داء الملك، داء الخنازیر، غدب، خنازیري | Scrofula, Kings evil | گەرومخڕە، سیلی لووی لەمڵاویی ژێر مل. |
| داء الذرة | | سەودای پێست. |
| داء جلدي | Dermatiosis | نەخۆشیی پێست. |
| داء الأسد، جذام دائر | Leprosy Turning | گولیی، پیسکیی، دووزامیی، ئاڵە، پەلووشین، خولاوە، سوورلوە. |
| دائرة ( في الهندسة) | Circle | بازنە، هێڵێکی چەماوەی داخراوی رێکە. |
| دائرة، حلقة | Ring, Circle | بازنە، چەمەرە، جغز، ئەڵقە، ئاخڵە. |
| دائري | Circular | بازنەیی. |
| دائرة حکومیة | Office | دایەرە، فەرمانگە. |
| دائرة البرید | Post-office | پۆستەخانە. |
| دائرة، التلغراف، دائرة البرق | Telegraph-office | تەلخانە، برووسکەخانە، دایەرەی تەلگوراف. |

| | | |
|---|---|---|
| دائرة كهربائية | Electric Circit | بازنەی کارەبا، بازنەیەکە بریتی‌یە لـە سوورگەی لێشاوی کارەبا کە لـە یەکێك لـە جەمسـەرەکانی سەرچاوەیەکی کارەبایی وەکوو پـاتری یـان دەینەمۆ دێتە دەرەوەو بەناو تەل بەرهەڵستیدا پێپەڕ دەبێت‌و دیسانەوە دەگەڕێتەوە بۆ جەمسەرەکەی تر بە سویچ دەکرێتەوەو دادەخرێت. |
| دائرة معارف، موسوعة | Encyclopedia | (ئینسکلۆپیدیا) فەرهەنگی زانیاریی فراوان، فەرهەنگی گشتیی فراوان. |
| دائرة زوال | Meridian | بازنەی زەوال، بازنەی نیـوەڕۆ، گـەورەترین بازنەیـە لـە ئاسمـاندا کـە بـە هەردوو پۆڵەکەدا، باکووری‌و باشووری، تێپەڕ دەبێـت، کـاتی نیـوەڕۆ لـە شـوێنێك دا ئـەو کاتەیـە کـەوا خـۆر بـە بازنـەی زەوالـدا لـەو شـوێنەدا، تێپەڕدەبێت. |
| دائرة قطبية | Polar circle | بازنەی پۆڵی، دوو بازنەیە، بازنەی پۆڵی باکووری کە ٥و٢٣ پلە لە پۆڵـی باکووری‌یـەوە دوورە، بازنـەی پۆڵـی باشـووری کـە ٥و٢٣ پلـە لـە پۆڵـی باشووری‌یەوە دوورە. |
| دائرة متجمدة شمالية | The Arctic circle | بازنەی ( چەمەرەی) سەهۆڵ بەندی باکووریی. |
| دائرة متجمدة جنوبية | The Arctic circle | بازنەی (چەمەرەی) سەهۆڵ بەندی باشووریی. |
| دائرة البروج | Zodiac ecliptic | بازنـەی کـەلوەکان، بازنـەی بورجـەکان، وێنـەی بازنەیەکـە کـراوە بـە (١٢) بەشـەوە هـەر بەشـێك وێنـەی کەلوویـەکی تیـا نەخشـە کێشـراوە وەکـوو کەلووی دووپشك، کارژۆلە . هتد. |
| دائرة قطبية شمالية | Arctic- circle | بازنەی پۆڵی باحووریی، ئەو هێڵەیە کە هاوڕێکە بە هێڵـی پـانی (٦٦) پلـەو (٣٣) خولەك کە دەوری پۆڵی ناوچەی سەرەوی زەوی داوە. |
| دائرة قطبية جنوبية | Antarctic-circle | بازنەی پۆڵی باشووری. |
| دائرة محيطية | Pericycle | بازنەی چێوەیی، چینێکە لـە خانـەی دیـوا تـەنك کەوتۆتـە نێوانـی شـانەی گەیاندن‌و توێخی ناوەوە لە ڕەگ‌و قەدی رووەکدا. |
| دائرية الفم، مستديرة الفم | Cyclostomata | دەم بازنەییەکان، دەم خڕەکان، کۆمەڵە گیاندارێکی بڕبڕەداری سەرەتایین لەجیاتی شەویلگە خەپلەیەکی (قرص) بازنەی لە دەوری دەمیاندا هەیە. |
| دائخ | Giddy, dizzy | گێژ. |
| دائم | Continuous continual | هەمیشە. |
| دائمي | Permanent | هەمیشەیی. |
| دائمي، معمر | Perennial | تەمەن درێژ، واتا تەمەنی لە دوو ساڵ زیاتر بێت. |
| دائم الخضرة | Ever-green | هەمیشە سەوز ئەو رووەکانەیە کە گەڵاکانیان ناوەرن لـە زستاندا، هەمیشـە سەوزن وەکوو درەختی سەرو. |
| دائن | Creditor | وامدەر.قەرزدەر. |
| داب، كسلان | Wall creeper | بە دیوارا هەڵگەڕ، جۆرە باڵندەیەکە. |
| داب، كلان | Brady pus | تەمەڵ، گیاندارێکی شیردەری بێ ددانی سستە خۆی بە لقی درەختدا هەڵدەواسێت. |
| دابة، حيوان، زاملة، بهيمة | Animal, beast | چوارپێ. |
| دابة الحمل | Pack-animal | بارگیر، چارەوا، چارەوێ، بارکێش، باربەر، دەوار، چالینگ. |
| دابرة، صيصة | Backtoe, Spur | چقە، پەنجەیەکی چچووکە بە پشتی قاچی کەلەشێرەوە، هەروەها بەو چوکڵە مردووە دەڵێـن کـەوا بـە پشـتی پێـی وڵاخـەوە لـە سـەروو سمەکەیەوە. |
| داتوليت | Datolite | (داتولیت)- بەردێکی بە نرخە ڕەنگەکەی سپی یان زەردی کاڵە. |

| | | |
|---|---|---|
| داتورة، تفاح، شوكي، نفير،بنج، صفير السلطان، جوز الماثل | Devils, apple, Thorns apple Datura, Jimson-weed | تاتوره، رووەکێکی ژەهرینە گوڵێکی سپی گەورەو بەرێکی دڕکاوی دەگرێت، بەرەکەی لە باینجان دەچێت، مادەیەکی سڕکەری تیادایە، دەرمانی لێ دروست دەکرێت بۆ نەخۆشیی ئاژەڵو وڵاخ. |
| داتورين، جوهر الداتورا | Daturine | (داتۆرین): دەرمانێکە لە تاتوره دەردەهێنرێت. |
| داجن، أليف | Domesticated Tame, Barnyard |ماڵیی، دەستەمۆ، کەهیی. |
| داحس، داحوس | Felon, paronychia, Whit low panaris, Agnail | بزماره، کەوڵە، مێخەکە، مووڵێهاتن، موی پەنجە، زیادەگۆشتی دەوری نینۆك، قلیشان یان برینداربوونی پێستی دەوری نینۆك. |
| داحس المواشي، داحوس المواشي | Cattle-whitlow | مێخەکەی ئاژەڵ، ئاوسانو ئازارو کێم کردنی پەلی ئاژەڵ. |
| داخل | In | لەناو. |
| داخلي، أنسي | Endo internal | ناو، ناوەوە، ژوورەوە ناوخۆ، ناوخۆیی، ناوەوەیی. |
| داخن، مدخن | Smoky | دوکەڵ کەر، دوکەڵدار. |
| دا ذي، هيوفاريقون دا ذي مخزني، رمان الأنهار | Hypericum Tutsan | (هایپریکەم) گیایەکە یان دەوەنێکە گوڵی زەرد یان سپی دەگرێت. هەناری روبار، گیایەکی دەشتەکیی پزیشکیيە گوڵەکەی زەردە، رەنگی سووری لێ دەردەهێنرێت. |
| دار | House | خانوو، ساختمان،ماڵ. |
| دار التصوير | Studio | (ستۆدیۆ) وێنەگا، شوێنی وێنەگرتن. |
| دار الاثار، متحف | Museum | مۆزەخانە. |
| دار ضرب العملة | Mint | دراوخانە، سکەخانە. |
| دار الحكومة | Headguarters | سەرا. |
| دار العجزة | Infirmary | تەمەڵخانە. |
| دار الوثائق | Archives | ئەرشیفخانە. |
| دار السينما | Cinema | سینەما. |
| دار الكتب | Public-library | کتێبخانە، کتێبخانەی گشتیی. |
| دار المجانين | Lunaticasylum | شێتخانە، مارستان. |
| دار التمثيل، دار الأوبرا | Theatre, Opera-house | ئۆپێراخانە، هۆڵی ئۆپێرا. |
| دار المعلمين | Teachers training School | خوێندنگەی مامۆستایان. |
| دار النقاهة | Convalescent Hospital | بووژانگە، خەستەخانەی بووژانەوە. |
| دارة-دورة | Circuit | حول، بازنە. |
| دارة الشمس، طفاوة | Solarhalo | خەرمانەی خۆر. |
| دارة القمر، هالة القمر | Corona, Halo, lunarhalo | خەرمانەی مانگ. |
| دارة | Cirque | ئەو چاڵاییەی کە لەسەر چیایەك پەیدا دەبێت بەکاری بەفرو هەندێك جار لەو چاڵەدا گۆمێك پەیدا دەبێت. |
| داروينية، نظرية داروين | Darwinism | تیوری داروین، ئەو تیورییەی کە زانای بەناوبانگ (داروین) دای ناوە دەربارەی گەشەکردنو گۆڕانی زیندەوەرەکان (گیاندارو روەك). |
| داروينية | Darwinia | (داروینیا) دارو دەوەنێکە لە کۆمەڵەی مۆرد بەناوی زانا داروینەوە ناونراوە گوڵی ئەرخەوانی یان زەرد دەگرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| دلرج، مألوف | Common, popular, Familiar | ئاسايى. |
| دلرجة | Limb | لاقى چوارپێ. |
| دلرعة | Armoured-Cruiser, Armoured- Battleship | کەشتیی جەنگیی زرێدار. |
| دارم | Oaktree | دارى بەڕوو. |
| دلرم، قنفذ، انقد، مدلج | Hedgehog | ژوژوو، ژیشك. |
| دلر فلفل، عرق الذهب | long-pepper, Spur-pepper , Bird pepper | جۆرێکە لە رووەکی دەلوبیبەر گەڵاکەی باریكو درێژە. |
| دلرسين، دارجين، دارصيني، دارصوص، قرفة سيلان، قرفة سرنديب | Cinnamon-tree | دارچینیی، درەختێکـە لـە رەگـەزی درەخـتی کـافوور، توێکڵەکـەی پێـی دەوترێت(دارچینیی) بەشێوەی بەهارات بەکاردێت. |
| دلر شيشعان، قندول | Spinybroom | دەوەنێکی درکاوییە گوڵـی زەردی بۆنخۆش دەگرێت. |
| دارلنجتونيا | Darlingtonia | (دارلینگتونیا)، رووەکێکە گەڵاکەی وەکوو تورەکە وایە مێشو مەگەز دەگرێت. |
| داس | Dace | (داس) جۆرە ماسی‌یەکە. |
| داسر، رفاس | Air screw, propellant Screw-propeller | پەروانە. |
| داسر سائل | Liquid propellant | پەروانەی شلە، جۆرێکە لـە پەروانـەی رۆکێت(صاروخ) بە پاڵنەرێکی شلە ئیش دەکات. |
| داصيور | Dasyure | (داسیۆر) گیاندارێکی شیردەری گۆشتخۆری بچووکە. |
| داعرة | Unfruitful plant | رووەکی بێ بەر، رووەکی نێر. |
| داغصة، رضفة | Patella, Kneecap | کڵاوەی ئەژنۆ، کەشکە ئەژنۆ. |
| داغي | Octodon | (ئۆکتۆدۆن) گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە مشك دەچێت. |
| دافع، حافز | Motive, Mobile, Drive, Impulse | پاڵنەر، کام. |
| دافع الصاعقة، شاري | Lightning Conductor | بەربەستی هەورە تریشقە، پارچە ئاسنێکە دەکرێت بە شوێنێکی بەرزەوە لە خانوو و کۆشکدا بۆ پارێزگاری لە هەورە تریشقە. |
| دافع، طارد | Repulsive, Repellent | دەرکەر. |
| دافیء | Warm | شلەتێن، شیرەتێن، نیمچە گەرم. |
| دافنيا، برغوث، الماء العذب | Daphniapulex | کێچی ئاویی، گیاندارێکی توێکڵداری بچووکە لە ئاوی شیریندا دەژی. |
| داكرون، ترلين | Dacron Terylene | (داکرۆن)، تەرلین، ریشاڵێکی دەستکردە پەردەو قاتە جلی لـێ دروست دەکرێت پێویست بـە ئوتـو ناکـات بـەرگری وشـکی‌و شـێ‌و زیـادکردن‌و کەمکردنی دەکات. |
| دڵ، دال | Jackal | چەقەڵ، توێریی. |
| دڵ، دۆل | Dhol | گورگێکی هیندی درندەیە. |
| دالة | Function | (فەنکشن)، بەڵگە، پابەند. |
| دالة جبرية | Algebraic-function | فەنکشنی جەبریی. |
| دالتونية، عمى الألوان | Daltonism Colour-blindness | رەنگ کوێریی، نەخۆشی‌یەکی چاوە، بەناوی پزیشـکی چاو (داڵتـون) نـەوە ناونراوە بەتایبەتی زەحمەتی جیاکردنەوە لەنێوانی رەنگی سووررو سەوزدا ئەم نەخۆشی‌یە لەنێوان پیاواندا زۆرتر روو دەدات وەك لە ژنان. وە ئەگەر ئەو رەنگ کوێرییە بە تەواوەتی بوو ئەوا بە سپیی دەبینێت کەم یان زۆر. |

| | | |
|---|---|---|
| دالج، قنفذ | Hedgehog | ژیشك، ژوژوو. |
| دالس، خافش | Lucifugous | شەوگەڕ، هەر مێروویەك حەز بەوە بكات كە لە تاریكیدا بگەڕێت. |
| دالي، غربيب | Black- grapes | ساحیریی، هەنگور ساحیری، جۆرێكە لە ترێ ڕەشكە. |
| دالوع | Lark | كلاوكوڕە، سۆفیەقیتە، شوان خەڵەتێنە، قازەلاخ. |
| داليا، دهلية | Dahlia | دالیا، ڕوەكێكی پیازییە، واتالا سەلكی هەیە گوڵەكانی گەورەو هەمەڕەنگەن بە شێوەی هێشوو، گەلێك جۆری هەیە. |
| دالية، شجرة الكرم | Vine, grape-vine | داری مێو، داری ترێ. |
| دالية | Varix | فراوان بوونی بۆڕی خوێنبەر یان خوێ هێنەر. |
| داما | Draughts, checker | دامە، جۆرە یارییەكە. |
| دامر | Dammar | (١)دامر جۆرە درەختێكە بەرمكەی لە بەری سنەوبەر دەچێت، زەمقێكی لێ دەردەهێنرێت بۆ دروسكردنی بۆیە (وەرنیش) بەكاردێت.<br>(٢) دامر جۆرە جەویی یان زەمقێكە لە درەختی دامر دەردەهێنرێت. |
| دامر | Bell-glass | زەنگی شووشە بۆ داپۆشینی ڕووەك. |
| دامس | Pitch-dark | تاریك، نووتەك. |
| دامق | Gibellina | (جیبیلینا) كەڕوویەكی زیا بەخشە بە ڕوەك. |
| دام، دامي | Bleeding | خوێناویی ، خوێنی لێ بێت. |
| دانق | Danik | دانك، دانە، بریتی‌یە لە یەك بەش لە شەش بەشی درهەمێك وە یەكسانە بە كێشی (٨) یان(١٠) دەنكە جۆ، جگە لەوە ناوی پارەیەكی كۆنە وەكوو پوول وابوە. |
| دانبوريت | Danburite | (دانبوریت) بەردێكی بە نرخە، كالسیۆمو بۆ رۆنی تیادایە ڕەنگەكەی سپی مەیلەو پەمبەیی‌یە. |
| دانتيل، دنتلا | Needle pointlace, Lac | دانتێل، قوماشێكی تەنكی كون كونە. |
| داهية | Sagacious | بلیمەت،زانا، زیت. |
| داودي، اقحوان، زهرة الذهب، اذريون | Chrysanthemum, Daisy, Dalmatian insect plant | داودیی، جۆرە گوڵێكی جوانە لە باخچەكاندا دەروێنرێت. |
| داودي سنوي | Crown Daisy | داودی ساڵانە. |
| داودي ثلاثي الألوان | Painted-Daisy | داودیی سێ ڕەنگ. |
| داودي ابو الطوبة | Globe daisy | داودیی تۆپزیی. |
| داية، قابلة | Midwife | مامان، داپیرك. |
| داينيل | Dynel | (داینیل) ریشاڵێكی دەستكردە بەرهەڵستی ئاوو شێ دەكات، قاتە جلی لێ دروست دەكرێت. |
| دينامو، مولد كهربائي | Dynamo | دینەمۆ، ئەو ئامرازەیە كە كارەبا پەیدا دەكات. |
| داين | Dyne | ١-داین، بریتی‌یە لە هێزی ڕاكێشانی زەویی لەسەر تەنێك كە بارستەكەی ٩٨١/١ گرامێك بێت وە لەسەر هێڵی پانی (٤٥) ە دانرابێت لەسەر ئاستی رووی دەریادا.<br>(٢) (داین، ئەو هێزەیە كەوا لە تەنێكی یەك گرامیی بكات كە خێراییەكەی ببێت بە یەك سانتیمەتر لە یەك چركەدا وە دەكاتە ١/١٠٠٠٠٠ نیوتن. |

| | | |
|---|---|---|
| دايل، مزول التلفون | Dial | (دايل) بازنەی تەلەفۆن کە ژمارەکانی لە سەرەو دەخولێنرێتەوە. |
| دايينى | Diene | (دایـین)، ئـەو ئاوێتـە ئۆرگانیکی‌یەیـە کـە دوو بـەندی جـووت لـەنێوانی ئەتۆمەکانی کاربۆنی ناویدا هەبێت. |
| دايا مغناطيسية | Diamagnetic | (دایاموقناتیسیی)، ئەو جـۆرە مادەیەیـە کـە لـە کایـەی موقناتیسـی دوور دەکەوێتەوە. |
| دايوبتر | Dioptre | (دایۆپتەر) یەکەی پێوانی هێزی زەرەبین. |
| دايوبتيز | Dioptase | (دایۆپتین) بەردێکی بە نرخە رەنگەکەی شین مەیلەو سەوزە. |
| دايستيز | Diastase | (دایستێن)، ئەنزیمێکە نیشاستە دەکات بە شەکری مالتۆز. |
| دايكرومات | Dichromate | (دایکرۆمات) رەگێکی کیمیاییی یەهاو هێزی یەکەی یەکسانە بە (٢) وەکوو پۆتاسیۆم دایکرۆمەیت. |
| دايسبروسيوم | Dysprosium | (دایسپرۆسیۆم)، توخمێکی میتالییە کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (١٦٢) و ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٦٦). ننیشانەکەی (Dy) توانای بوونە موقناتیسی هەیە. |
| دب | Bear | ورچ، هرچ، هرس، خرس. |
| دب البحر | Sea-bear | ورچی دەریا، جۆرێکە لە شێری دەریا واتا گیاندارێکی دەریایی‌یە لە ورچ دەچێت. |
| دب قطبي، دب ابيض | Polar-bear | ورچی پۆلـیی، ورچـی سـپیی، ورچێکـی زۆر گـەورەی سـپیی لـە پۆلییـی مەلەوانە باکوریدا دەژێز |
| دب رمادي | Greybear | ورچی خۆلەمێشیی، ورچێکـی زۆر گەورەیـە جـاری وا هەیـە کێشـەکەی دەگاتە (١٤٠٠) پاوەن. |
| دب كودياك | Kodiak bear | ورچی کۆدیاك، ورچێکی کەتەیە. |
| دب امريكي، بريبال | Baribal bear American black bear | ورچی ئەمریکییە بریبال، ورچێکی رەشە. |
| دب ذو نظارة | Spectacled-bear | ورچی چاویلکەدار، جۆرە ورچێکە پەڵەیەکی ئەڵقـەیی رەش وا بـەدەوری چاویەوە بەسەر لقی درەختەکاندا هەڵدەگەڕێ میوەخۆرە. |
| دب كسلان، دب العسل | Sloth bear | ورچی تەمەڵ، ورچی هەنگوین، جۆرە ورچێکە لە قەراغ ئاودا لە هیندستان دەژی‌و میوەو مێروو دەخوات چونکە بێ ددانە خۆی بە لقی درەختـەکاندا شۆڕ دەکاتەوە. |
| دب ابقع، دب الخيزران | Parti-Coloured bear, Aeluropus | ورچی بەڵەك، ورچی حەیزەران، ورچێکە لەناو بێشـەڵانی حـەیزەراندا دەژی لەشی سپی‌یە پشت‌و پەلەکانی رەشن. |
| دب اكبر، الدب الأكبر، دب اصغر، الدب الأصغر، | Ursa-Major , Great bear Ursa Minor, Little bear | ورچـی گـەورە، حەوتەوانـەی گـەورە، حـەوتبرایان، شـەلە، کۆمەڵـە ئەستێرەیەکە، ورچی بچکۆڵە، حەوتەوانە بچووك. |
| دب النمل، خنزير الأرض | Earth pig, Ant bear | ورچی مێرووله، بەرازی زەوی، جۆرە گیاندارێکی شیردەری بێ ددانی کلك درێژی زمان درێژی مێرووله خۆرە. |
| دباب،نعنع الحقل، فلية، فوتنج بري | Pudding- grass | پونگە، گیایەکی بۆنخۆشە لە نەعنا دەچێت بەشێوەی سەوزەو بەهارات‌و دەرمان بەکاردێت. |
| دبابة | Tank | دەبابە، ئوتومبیلێکی زرێ‌دارە پێچکەکانی لە ئاسنە، تۆپ‌و تفەنگی پێوەیە لە جەنگدا بەکاردێت. |
| دباء، قرع | Gourd | کوولەکە، کودیی، کولند. |
| دباة | Locust-nymph | پێکورەی کولله، بەچکەی کولله. |

| | | |
|---|---|---|
| دبارة، دبرة | Trench | ئەو مشارەو جۆگەیەی کە زەویی پێ ئامادە دەکرێت بۆ کشتوکاڵ. |
| دباسي | Gouras | کۆترە دۆشاویی، جۆرە باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی کۆتر رەنگەکەی سووری مەیلەو قاوەییە. |
| دباش | Phyllorhina | جۆرێکە لە شەمشەمەکوێرە. |
| دباغ، دباغة، دبغ | Tanning | دەباخ کردن، پێستە خۆش کردن، تاڵدان، دەباخچێتیی، بۆنگچێتیی، گۆڕینی پێستی خاو بۆ چەرم بەهۆی مادەی دەباخ کەرەوە کە لە جەوتو مازوودا هەیە. |
| دباغ الجلود | Tanner | پێستەخۆشکەر، دەباخچیی، بۆنگچیی. |
| دباقة | Vissose | (فیسکۆس) جۆرێکە لە سلیلۆز لە ئاوریشمی دەستکرددا بەکاردێت. |
| دبال | Humus | پەین، پەینێك کە سەرچاوەکەی گیاندارو روەك بێت. |
| دبب، زغب | Down | کورك، گەنگەمو. |
| دبة، جهبر | She-bear | ورچی مێ. |
| دبح، سلسفيل، فومي، لحية التيس | Scorzonera, salsify | هەڵەکۆك، گیایەکە گەڵاکەی درێژە سەلکەکەی لە گێزەر دەچێت دەخورێت. |
| دبدبة، حبو | Crawling creeping | گاڵگۆلکێ، رۆیشتنی منداڵی ساوا. |
| دبر | Anus | قنگ، کۆم، دامان، پامان، قوون. |
| دبر، زرقطة | Yellow wasp | زەرگەتە، زەردەزێرە، زرکێتك، جۆرێکە لە زەردەواڵە بچووکە رەنگەکەی رەشو زەردە. |
| دبران، الدبران، ثور | Aidebaran | نیشتەجێی مانگ، پێنج ئەستێرەن لە کەلووی گادا. |
| دبسي | Gouras | راجع (دباسي). |
| دبس | Grape jamMolasses,  Treacle | دۆشاو، دۆشاق، شۆك، ئاوی ترێ، یان خورما کە بە کوڵاندن خەست کرابێتەوە. |
| دبس الرمان | Pomegranate-molasses | ربەنار، ربەهەنار، دۆشاوی هەنار، قاتولیی. |
| دبس مجفف  مع نشا | Drie-molasses | باسووق، باستووق. |
| دبس مكثف، دبس ثخين | | جەلاقی، دۆشاوێکە بە کوڵاندن توند دەبێتەوە. |
| دبسي | Watermelon | شووتیی، شفتیی. |
| دبسية، فاختة النخيل | Palmdove | کوکوختیی دارخورما، جۆرە کۆترێکە. |
| دبسة | Bay,  roan, brown red | شێ، رەنگی سووری مەیلەو رەش. |
| دبش | Rough stone,  Rubble stone | بەردی خاو کە نەقاریی نەکرابێت. |
| دبق، دابوق | Glue, Birdlime | دەمووکانە، موخور، جۆرە سرێشێکی لینجی سەوزە لە بەری روەکی دەمووکانەدەر دەهێنرێت، دەدرێت لە دارو درەخت بۆ ئەوەی باڵندەی پێوە بنووسێت بۆ راوکردن. |
| دبق البلوط، دبق مقدس، لورنتس، بنتومسة، عنم اوروبي | Viscum, mistletoe | دەمووکانە، موخور، دەبقان، دمووکانەی بەڕوو، روەکێکی مشەخۆری هەمیشە سەوزە، گەڵاکەی هێلکەییە گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی سپی یان زەردی بچووکی ، لەسەر لقی هەندێك درەختی بەردار دەڕێو ئاوکەکەی هەڵ دەمژێت، هەندێکی بەرەکەی سوورە لەسەر درەختی زەیتوون دەردەکەوێت،سرێشێکی لینجی سەوزلە بەرەکەی دەردەهێنرێت پێی دەوترێت (دەموکانە) دەدرێت لە دارو درەخت بۆ ئەوەی باڵندەی پێوە بنووسێتو راوبکرێت جگە لەوەی کە بەرەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| دبق، مقاس، سبستان، مخاطة، هدال | Sebestens plum, Cordia, Assyrian plum | داری دەمووکانە، جۆرە دارو دەوەنێکە قەراغی گەڵاکەی دەندانەدارە گوڵەکەی سپیی یان زەردە بەرەکەی ناوکدارە، کاکڵەکەی لینجە بۆ مەبەستی راوکردنی باڵندەو لە پزیشکییدا بۆ مەبەستی ئازاری سنگ بەکاردێت. |
| دبقيات | Loranthus | دەمووکانییەکان، کۆمەڵە روەکێکی مشە خۆرن لەسەر درەختی بەردار دەژین. |
| دبل، جحش | Youngass | جاشەکەر. |
| دبل، دبلة | Bubo, Tumour Tumor | سندان، سنتان، خەیارە، ئاوسانی لووی لەمفی نێوان بەرەوسڵان و بنی ران. |
| دبلة، خاتم بلا فص | Ring | ئەڵقەی ژن هێنان، ئەموستیلەی ژن هێنان، ئەلقەی نیشانەکردن. |
| دبلوم | Diploma | ودم، (دیبلۆم)، بڕوانامەیەکی خوێندنی بەرزە دوای پلەی خوێندنی ئامادەیی وەردەگیرێت لە بەکەلۆریۆس نزمترە. |
| دبلوماسي | Diplomat | (دیبلۆماسیی)، هونەرمەندی رامیاریی، نوێنەری وڵاتێك لە وڵاتێکی تردا. |
| دبلوماسية | Diplomacy | (دیبلۆماسێتیی) نواندنی رامیاری. |
| دبلودوكس | Diplodocus | (دیپلۆدۆکس) جۆرێکە لە گیانداری دینۆسۆری قڕتێ کەوتوو گیاخۆرە بووە. |
| دبورة | Stonehammer | ئامرازی بەردتاشینی، چەکوش بەرد تاشینی. |
| دبور | West wind, Zephyr | بای رۆژئاوا، بای خۆرنشین. |
| دبور، زنبور | Wasp, Hornet Vespid | زەردەواڵە، ژەنگەسوورە، ستێنگ. |
| دبور البلح | | |
| دبوس | Pin | دەرزیلە، دەرزیی سەرخڕ، دەرزی دەبووس. |
| دبوس انكليزي، دبوس الأمان | Safety pin | دەرزی سنجاق. |
| دبوس مزدوج السن | Staple | دەرزی دووسەر. |
| دبوسية | Mushroom | قارچک، گوارك. |
| دبون، لسان الثور، بوغلص مخزني | Bugloss | گیایەکی پزیشکییە گوڵەکەی شین یان بنەوشەییە. |
| دبيب | | (١) ئاورۆشن کەرەوە، جۆرە مێروویەکە بەسەر ئاودا یاری دەکات. |
| دبيب، حباحب | Glow-worm, Firefly | (٢) گوڵە ئەستێرە، مێروویەکە بەشەو رووناکی دەداتەوە. |
| دبيب | Creeping | (٣) خشان بەسەر زەویدا. |
| دبيب الحوت، ذات النفسين | Ceratodus | دوو هەناسە، جۆرە ماسییەکە دوو ئەندامی هەناسەدانی هەیە. |
| دبيكة | Fruited bedstrow | گیایەکە گوڵەکەی سپییە بەرەکەی دوو فاق و کلکدارە. |
| دتموس | Ditomus | سن، ئەسپێی گەنم، جۆرە مێروویەکی ناوقەد باریکی زیانبەخشە بە دەغڵودان. |
| دث، دثاث | Little-rain | نمەباران، بارانێکی سووك. |
| دثار | Cover, Clothes | جلوبەرگ، کاڵای ئاودامان، پەلاس. |
| دثيمة، فارة الأحراج | Field-mouse | مشکی کێڵگە. |
| دثارة، حرام | Blanket | بەتانیی، پەتوو. |
| دثار بخار، قميص بخار | Steam jacket | بەرگی هەڵمیی، ئەو کەلێنەی کە دەورووپشتی بۆرییەکی دەوەو هەڵمی ئاوی پیادا تێپەر دەکرێت، بۆ مەبەستی گەرم کردن یان رێکخستنی پلەی گەرمیی. |
| دج، سمنة، سكلة | Field-fare, mavis, thrush, Throstle | بۆقژە، باڵندەیەکی دەنگ خۆشە لە کۆمەڵەی ریشۆڵە. |
| دج مطوق، | Ring ouezel | بۆقژەی ئەوقدار. |
| دجاجة | Cygnus, swan | مریشك، ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |

| | | |
|---|---|---|
| دجاج، دجاجة | Fowl, hen Bonasa | مریشك، مر، مامر، مرغ، کەرك. |
| دجاجة الاجراح سلكان | Bonasa | (بوناسا) مریشکی بێشەڵان، باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی سوێسکە لەناو شاخدا دەژی دەنووکی کورتە کلاّودارە. |
| دجاج اسود | Black-hen | مریشکەڕەشە، مریشکی شامی. |
| دجاج الثلج، کديري | Snowcock | کەودەری، باڵندەیەکی کێوییە (٣) ئەوەندەی پۆڕ دەبێت ڕەنگەکەی خۆڵەمێشیی مەیلەو شینە، پەڕەکەی هێڵی قاوەیی تیادایە، لە ناوچە شاخاوییە بەفرینەکاندا دەژی. |
| دجاج الماء | Moorhen, Water hen, coot | مریشکی ئاویی، قەلمراو، مریشکەڕەشە، جۆرە مراوییەکە لە زەلکاودا دەژی پەڕەکەی ڕەشی مەیلەو قاوەییە ژێر کلکی سپییە، سەرو ملی ڕەشە پشتو باڵی سەوزی مەیلەو قاوەییە کلکی ڕەشە دەنووکی سوورە. |
| دجاج البراري، طيهوج | Grouse | قەتێ، باڵندەیەکی دەشتەکیی مەیلەو قاوەیی کونجە. |
| دجاجة الأرض | Woodcok | مریشکی زەویی، مرە باخیی، مرەلارە، جۆرێکە لە مریشك دەنووکی درێژە. |
| دجاج حبشي، دجاج سندي، دجاج فرعون، دجاجة غينيا، غرغر | Guinea fowl Galeeny | چێو ماچینی، مریشکی غینیا، مریشکی پۆپنەوار، مریشکێکی ڕەش کونجە واتا پنکەی سپیی پێوەیە. لە ئەفریقیاو بیابانی عەرەبیدا دەژی. |
| دجاجة اليوكالبتوس | Mallee fowl | مریشکی یۆکالیبتۆس، مریشکی ماڵی. |
| دجاج البحر | Sparus | مریشکی دەریا، جۆرە ماسییەکە. |
| دجاجة حاضنة، دجاجة حضون | Broodinghen | مریشکە بەکڕ، قۆپك. |
| دجاجة هازل | Hazel hen | مریشکی هازل، باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی پوڕ لە دارستانی چڕدا دەژی. |
| دجاجة المستنقعات | Marsh hen | مریشکی زەلکاو. |
| دجاج هندي، دجاج رومي، ديك رومي | Turkey-hen<br>Turkey cock | قەل، قەلەموون، بۆقلەموون عەلیی شیش، عەلو عەلو. |
| دجاج ليكهورن | Leghorn | مریشکی لیگهورن، جۆرێکە لە مریشك بۆ هێلکە پەروەردە دەکرێت. |
| دجاج كوجن | Cochin- china | مریشکی کۆچن، جۆرێکە لە مریشك بۆ گۆشتەکەی پەروەردە دەکرێت. |
| دجاجيات | Galliformes | مریشکییەکان، کۆمەڵەی مریشك، ئەو باڵندانەی کە لە مریشك دەچن وەکوو قەتێو عەلیی شیش. |
| دجانة، علم الدواجن | Zootechnics | زانیاری پەلەوەر، زانیارییەکە باسی ڕەچەڵەكو وەچەو چۆنێتیی پەروەردەکردنو سوودوەرگرتن لە پەلەوەر دەکات. |
| دجالة، قطران | Tar | قەتران، مادەیەکی شلی ڕەشە لە خەلوز دەردەهێنرێت.. |
| دجر | Vigna | کۆمەڵە ڕووەکێکی گیایی کشتوکاڵین بەرەکەیان بچووكو لەشێوەی گورچیلەدایە وەکوو لۆبیا. |
| دجر، قلث، حمص | Gram, Chick-peas, Horsegram | نۆك، گیایەکی ساڵانەیە دەنکەکەی خڕو سپیی مەیلەو زەردە دەکرێت بە چێشت. |
| دجر صيني ، ماش شرقي، لوبيا | French-bean, Cow-pea, Laubich-grains, Kidney-beans, cherry-bean | لۆبیا، لۆبیك، گیایەکی ساڵانەیە دەنکەکەی سپیو گورچیلەییە دەکرێت بە چێشت. |
| دجرانة | Stick | سنگی ڕووەك، کۆڵەکەی ڕوەك، ئەو پارچە دارە یان قامیشەی کە لە باخو بێستاندا دەچەقێنرێت لە پاڵ ڕوەکدا بۆ ئەوەی خۆی پێوە هەڵواسێت. |
| دجلة | | ئەو شوێنەی کە هەنگی کێویی هەنگوینی تیا دادەنێت. |

| | | |
|---|---|---|
| دجنة، ظلمة، دجي | Darkness | تاریکیی، نوتەکیی. |
| دجن | Patch of haze | سێبەری هەور. |
| دجنة | Nimbus | هەورێکی باراناویی چڕی چڵکن. |
| دجوي، رامس، ليلي | Nocturnal Nightly | هەر گیاندارێك بە شەو بگەڕێت، گیانداری شەو گەڕ. |
| دجية | Larva-bee | بەچکەی هەنگ، کرمی هەنگ، لارڤای هەنگ. |
| دجية | Darkness | راجع (دجنه). |
| دحاب | Copulation of insects | جووت گرتنی مێروو بۆ زاوزێ. |
| دحاس | | کرمێکی زەردە لەژێر زەویدا دەژی. |
| دحدحة، لين العظام | Achondroplasia | ئێسك نەرمیی، گێڕیی. |
| دحدح، دحدوح | Dumpy, pudgy, squant | قەڵەوی،کورتەبنە، گیپن،، سیخن، بنەمۆم، گدۆڵ، دوو گوردیی، بابەعەمرە. |
| دحدورة، احدورة، منحدر، انحدار | Declivity, Runway | سەربەرەوژێرە، لێژایی. |
| دحداح، زنبقية | White lily | زەمەقیی سپیی، ڕوەکێکی پیازییە لە کۆمەڵەی نێرگز گوڵی هەمەڕەنگ دەگرێت بە تایبەتی سپیی. |
| دحرجة | Rolling | تل کردنەوە، تلۆرکردنەوە، خل کردنەوە، خلۆرکردنەوە، گل کردنەوە، گلۆرکردنەوە. |
| دحريج، دحيريجة، زۆان | Spurred Vetch Tare, Darnel Common Vetch | زیزانە، گیایەکی دەشتەکییە لە ناو و نیسكو نۆكو دەغڵودانێدا دەڕوێت دەنکەکەی خڕو زۆر ڕەقە. |
| دحس، دحش | Inserting | پڕکردن، ئاخسنن، خۆکردن بەناودا. |
| دحس | To seed | تۆو کردن، گوڵە گەنمێك پڕببێت لە تۆو. |
| دحض | Refutation, Confutation | پەرچ دانەوە. |
| دحق | Bitter Cucumber | خەیاری تاڵ. |
| دحل | | راجع (دحدح دحدوح). |
| دحم | Begetter (male) | ڕومکی نێر. |
| دحمور الأرق، اسد المن | Aphis lion | شێری مێش گەزۆ، مێش گەزۆخۆر، مێرویەکە مێش گەزۆ دەخوات. |
| دحة | Gastroptosis | شۆڕبوونەوەی گەدە، داکەوتنی گەدە. |
| دحو | Exending the Soil | شیکردنەوەو تەخت زەویی. |
| دحية، قردة، القة | She monkey | مەیمونی مێ، دێڵە مەیموون. |
| دخاس | Eumenes | (ئیومینس) جۆرە مێرووییەکی ئاوقەد باریکی بە سوودە، ڕەنگی ڕەشە هێڵی زەردو سووری تیادایە. |
| دخان | Smoke<br>To bacco | ١- دوکەڵ، کادوو ، کادیی، دیکێل.<br>٢- توتن، تەماکۆ. |
| دخال، دخال الأذن، ثاقب الأذن، ابو مقص، نهيك | Earwig, Galley-worm | گوێ کونکەرە، سۆلسۆلە، هاڕیی، مێرووییەکە لە دوپشك دەچێت کلکی دوو فاقە لە مقاش دەچێت، باوەڕ وایە کە دەچێتە گوێچکەوەو کونی دەکات. |
| دخداخ، دخدوخ | Catkin, gallay worm | گیاندارێکی جومگەداری ڕەش و سوورە لە هەزارپێ دەچێت زیان بە ڕەگو بەری ڕوەك دەگەیەنێت. |
| دخس، دلفين | Dolphin | (دۆلفین) جۆرێکە لە نەهەنگ. |
| دخس، نبج | Exostosis | ئاوسانی سمی وڵاخ. |

| | | |
|---|---|---|
| دخل (في الاقتصاد) | Revenue | دەستكەوت، دەرامەت. |
| دخلة، قرقفنة، نمنمة، زريقة، شوالة، هازجة، ام نضارة. | Warbler, Black cap, Chiffchaff, White throat Sylvia | فیرنەگولە، كلاورەش، باڵندەیەكی گۆچكەری رەنگینی دەنگ خۆشە لە كۆمەڵەی چۆلەكە. |
| دخن | Smoky | بۆكن، خواردەمەنیی بۆ دۆكەڵ وەكوو هەندێك جار لە ماستدا دەبێت. |
| دخن، دخنة، جاورس | Millet, Bristle grass panic grass, Cockspur panicum Bengal grass | بۆكن، خواردەمەنی بۆدۆ.گاڵ، كزن، هەرزن، رەمەدانە، گەلوو، گاریس، گاریس زوراتی سپیی، گیایەكە لە كۆمەڵەی دەغڵودان دەنكەكەی بچووكە دەدرێت بە باڵندە. |
| دخنية، جاورسية | Miliaria | (میلیاریا)،نەخۆش ئاوسان‌و خورانی پێست‌و ئارەقكردنەوە. |
| دخناء،دخنان، ابو دخنة، دخلة القصب، هازجة القصب | Reed warblar Sedge Warbler | باڵندەیەكی سوورە، لە كۆمەڵەی چۆلەكە. |
| دخول | Entering | چوونەژوورەوە، چوونەناوەوە. |
| دخينة | Stink grass | گیایەكە بەرەكەی خڕی مەیلەو سوورە. |
| دخين | Yellow bristle grass | جۆرە گیایەكە. |
| دخيلة | Adventitious | گژو گیای زیان بەخش بە روەك. |
| دخيلة | Weeping willow | شوڕەبیی، شەنگەبیی. |
| د.د.ت، دي. دي. تي | D.D.T | (دی. دی. تی) كورتەی ئەم ناوەیە (دای كلۆرۆدای فەنیل ترای كلۆرۆئیثان)، دەرمانی قەڵاچۆكردنی مێروو. |
| درابة | Willow grass | گیایەكی رازاندنەوەیە گوڵی سپیی‌و زەرد دەگرێت. |
| درابزين، درابزون | Handrail, Balustrade Railing | تارمە، چاخ،نەردە، سدارەی باڵەقۆن. |
| دراجة، دراجة هوائية | Bicycle | (پایسكل)، پاسكیل، ئەسپە ئاسنینە. |
| دراجة بخارية | Motorcycle | (ماتۆرسایكل)، ماتۆرسكیل. |
| دراسة | Studying | خوێندن، لێكۆڵینەوە. |
| دراس | Threshing | گێرەكردن، كوتان، جیاكردنەوەی تۆوی روەك لە بەرەكەی یان توێكڵەكەی. |
| دراسة، الة دراس، نورج | Threshing machine | مەكینەی گێرە، جەنجەڕ، پاتۆس. |
| درانة، درين | Stock | پەرێز، پاشماوەی دەغڵودانی دوراوە. |
| درام | Hedge hog, Oak tree | ١-ژیشك، ژووژوو.<br>٢-درەختی بەڕوو. |
| دراق، دراقن، فرسك، خوخ | Peach | قۆخ، شەفتالوو، هەشتالوو. |
| دراية، علم | Knowledge | زانین، زانیاریی. |
| دراج،درجوج، حيقط، حيقطان، ابو خطار ، ابو ضبة، ثبت | Francolin, black partridge | پوڕ، زیوەكەو، زڕەكەو، كەناچە، تڵیلك، سوێسكە رەشە، باڵندەیەكی دەشتەكی‌یە لە سوێسكە دەچێت بەڵام گەورەترەو كونجە واتا پنكە پنكەی رەش‌و سپیی پێوەیە دەنووكی كورتە گۆشتەكەی خۆشە لە گوێ ئاو و ئاو پێشەڵاندا دەژی. |
| دراج الصخور، قبج، حجل رومي | Chukor, Rock-partridge | كەو: باڵندەیەكی رەنگ خۆڵەمێشیی خاڵ‌و میل دارە دەنووك‌و قاچی سوورە دەنگی خۆشە لە چیاكاندا دەژی. |

| | | |
|---|---|---|
| در الحليب | Lactation | پەیداکردنو دەردانی شیر. |
| درامة | She hare | کەروێشکی کێویی مێ. |
| دریانی، سنمة | Zebu, humped Cattle | جۆرێکی گەورەیە لە گاپشت ملی دووگی پێوەیە لە هیندستان دەژی. |
| درب، لسان | Chirocentrus | ماسی‌یەکی دەریایی‌یە رەنگەکەی زەردی ئالتونی‌یە. |
| درباس | Watchdog, mastiff | سەگی پاسەوانی. |
| دربکة، دربلة | Earthen-Kettle drum | تەپڵ. |
| درب التبانة، درب الحليب | Milky way | رێگای کاکێشان، رێگاکادزا، کۆمەڵێکە لە ئەستێرەی زۆر بچووك بەشێوەی دوو هێڵی سپیی لە ئاسماندا دیارن. |
| دربة، سنام الثور | Boss, Hump | دووگی پشت ملی گا. |
| درب | Road, path, Way | رێگە. |
| دربز | Lock and key | کلیلو کلۆم. |
| دربجة | Copulation(in Birds) | ئارەزووی باڵندەی مێ بۆ جووتکردن. |
| درة، لؤلؤة كبيرة، جوهرة | Great pearl Gem | گەوهەر، مرواریی گەورە، گەوهەری شەوچرا. |
| درة | Parakeet | (پاراکیت) جۆرێکە لە تووتیی رەنگەکەی سەوزە. |
| درة البحر | Parrot-wrasse | ماسییە تووتیی، ماسی‌یەکی دەریایی‌یە رەنگ ئەرخەوانی‌یە بەشێوە لە تووتیی دەچێت. |
| درجع | Pigeon-pea | پۆڵکەی هیندیی، جۆرێکە لە دانەوێڵە وەکوو هەرزن بە شێوەی دان دەدرێت بە کۆتر. |
| درجة، دريجة، قطيرة | Sander-ling | زیقاوڵە، باڵندەیەکی لاق درێژە لە قەراغ ئاودا دەژی. |
| درج، سلم | Stair | پێ پیلکە، پەیژە، پلیکانە، پەیسك، پێسترك. |
| درج، جارور | Drawer, Calibrate | چاوی مێزو دۆلاب. |
| درجة، حد | Rate, Ratio | رادە. |
| درجة، رتبة، منزلة | Rank, Grade | پلە، رادە. |
| درجة، علامة | Mark | نمرە. |
| درجة | Degree | پلە ١- لە فیزیادا: ماوەی نێوانی دوو نیشانەی یەك لەدوای یەك وەکوو لە ئامرازی گەرمیی پێودا.<br>٢-لە بیرکاریی(ماتماتیك) دا: یەکەی پێوانی کەوانەو گۆشە کە دەکاتە(١/٣٦٠) لە چێوەی بازنە. |
| درجة الحرارة | Temperature, Centigrade | پلەی گەرمیی، بە دوو رێگە دەپێورێت: ١- فیهرنهایتی: لێرەدا پلەی کوڵانی ئاو ٢١٢° و پلەی بەستنی ئاو٣٢°.<br>ب- سەدیی، لێرەدا پلەی کوڵانی ئاوو ١٠٠°، پلەی بەستنی ئاو سفرە. |
| درجة حرارة الجسم الأسود | Black body Temp | پلەی گەرمیی تەنی رەش. |
| درجة حرارة الأتقاد | KindlingTemp | پلەی گەرمیی، کڵپەکردن، پلەی داگیرسان. پلەی گڕگرتن،ئەو پلەی گەرمی‌یەی کە پێویستە هەر مادەیەك بیگاتێ بەر لەوەی کە بسوتێت. |
| درجة الحرارة الحرجة | Gritical Temp | پلەی گەرمی، شڵۆق، بەرزترین پلەی گەرمیی کە دەتوانرێت گازێکی تیادا بکرێت بە شلە بەهۆی پاڵەپەستۆوە، واتا ئەگەر گازێك لە پلەیەکی گەرمی بەرزتردا بێت وەك لە پلەی گەرمیی شڵۆقەکەی ناتوانرێت بکرێت بە شلە بەهەر پاڵەپەستۆیەك بێت. |

| | | |
|---|---|---|
| درجة الحرارة المطلقة | Absolutetemp | پلەی گەرمی بێ پایان، پلەی گەرمیی پەتیی. |
| درجة الغليان | Boiling point | پلەی کوڵان، پلەی کوڵاندن، پلەی کوڵانی ئاو (١٠٠ °) ی سەدییە. |
| درجة الأنجماد | Freezing point | پلەی بەستن، پلەی بەستنی ئاو سفری سەدییە. |
| درجة الأنصهار | Fusion point | پلەی شلەوەبوون، ئەو پلەیەی کە تەنێکی رەق تیایدا دەبێت بە شلە. |
| درجة الثبات | Stability degree | پلەی جێگیریی. |
| درجة التبخر | Evaporation degree | پلەی بە هەڵم بوون، پلەی هەڵمین. |
| درجة النغمة | Pitch | پلەی ئاواز/ ژمارەی ئەو لەرانەی کە ئاوازێك لـە چرکەیەکدا پەیدای دەکات. |
| درجة التأين | Degree of Ionizatation | پلەی بوونە ئایۆن، پلەی ئایۆنین. |
| درجة البلمرة | Dgree of polymerization | پلەی پەلمەرین. |
| درجة التفكك | Degree of Dissociation | پلەی هەڵوەشان. |
| درجة التحلل | Degree of Hydrolysis | پلەی شی بوونەوە. |
| درجة التركيز الجزيئية | Molarity | (مۆلاریتیی)، پلەی پەیتی مۆلیکیوڵی، پلەی پەیتیی گەردیی. |
| درجة التركيز | Molality | (مولالیتیی)، پلەی پەیتیی. |
| درجة الندى | Dew point | پلەی ئاورنگ، پلەی شەونم. |
| درجة الصوت | Sound degree | پلەی دەنگ. |
| دردار، شجرة البق بوقيصا، خرخفتي، فرغار، غرغار | Ash, Elm | رەشـــەدار، دارەرەش،، وزم، نـــارەوەند، بنـــاو، بنـــاف، دارتۆفانـــە، دارمێشووله،درەختێکە کەڵێك جۆری هەیە، گەڵاکەی دەوەرێت، لە ناوچە ساردەکاندا دەروێـت، بـۆ سێبەر بـەکار دەهێـنرێت، گەڵاکـەی گـەورەیـە، گوڵەکەی بچووك‌و سەوزە، بەشێوەی هێشـوو شـۆڕ دەبێتـەوە، هـەندێکی گوڵەکەی سپی‌یەو، تۆوەکەی باڵدارە بە هـەوادا بڵاو دەبێتـەوە بەرەکەی لە هەنار دەچێت ناوەکەی شێدارە کە رەتەقێت مێشوولەی لێ دێتە دەرەوە. |
| درداب | Musk melon | شەمامە، کاڵەکی زەرد. |
| دردبيس، عجوز، حيزبون | Crone | پیرێژن، پیرێژنە قاریی. |
| دردون | Dryodon | (درێودۆن)، جۆرە کەروویەکی زیان بەخشە بە رووەك. |
| دردور | Whirlpool | گێـژاو، گـەرداو، شـوێنێکە لـە دەریـاو رووبـاردا، ئاوەکـەی بـەهێز دەروات مەترسی پەرینەوەی لێ دەکرێت. |
| دردي، ثفل، عكارة | Dregs sediment lees, Detritus | تلپە، خڵتە. |
| درد (درداوات)، ثرم | Edentata, Toothless | بێ ددان، دەم پووچ، گیاندارێکی بێ ددانی شیردەرە نینۆکێکی تیژی هەیە بۆ هەڵکەندنی زەویی وەکوو گیانداری مێرووله خۆر. |
| دررة، فرفارة | Weather cock | کەڵەشێری با، ئامرازێکە بۆ دەست نیشانکردنی رێڕەوی با. |
| درزن، درزينة، دوزينة، دستة | Dozen | دەستە، دوانزە، دەرزەن. |
| درزة، درز | Suture | درز، تەقەڵ، شـیرازە، هێڵـی نێوانـی لێـواری دوو شـتی بەیـەك گەیشـتوو، دەزووی برین دوورینەوە. |
| درس، محاضرة | Lesson, Lecture | دەرس، وانە، خوێندن. |
| درس، دراس | Threshing | گێرە، گێرەکردن، گوتان. |
| درسة، درسة الشعير، ارطان | Bunting, Ortolan Bunting | جۆخۆرە باڵندەیەکە لە چۆلەکە دەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| درص | Young mouse | بەچکەی مشك یان پشیله یان ژیشك. |
| درع | Shield | قەڵغان، زرێ، زرخ، مەتاڵ، کۆست. |
| درع | Armature | (ئارمێچەر)، بەشێکە لە ئامرازی دینەمۆ، وزەی کارەبای پێ دەکرێت بە وزەی میکانیکی یان بە پێچەوانەوە، لە ئاسنی نەرم یان پۆڵا دروست کراوە. |
| درعة | Cuiras | توێکڵی لەشی مێروو. |
| درعة | Fibre | ریشاڵ. |
| درع واقي | Protective Shield | شوورەی پارێزەر، شوورەیەکی کۆنکریتی‌یە بە دەوروپشتی تەنووری ئەتۆمیدا دروست دەکرێت دژی ئەو تیشکە زیان بەخشانەی کە لە تەنوورەکەوە دێتە دەرەوە. |
| درعاء | | مەڕێك کە سەری رەش‌و لەشی سپیی بێت. |
| درغل، ترغلة | Turtledove, Dove | قومریی، گاکۆتر، کۆترە کێویلە. |
| درفلة المعادن | Rolling of metal | داڕشتنی کانزاکان بە شێوەی شیش‌و پلێت‌و بۆریی. |
| درفيل، دلفين | Dolphin | (دۆلفین)، جۆرە نەهەنگێکە. |
| درقة | Silpha, Scute | جۆرێکە لە قالۆنچە هەندێکی زیان بەخشە بە رووەك. |
| درقة | Carapace Scute, scutum | قەڵغان، ئەو توێکڵە ئەستوورەی کە لەشی هەندێك گیاندار دادەپۆشێت، وەکوو قەڵغانی کیسەڵ. |
| درق الطيور، زرق الطيور، سلح الطيور | Excrement-of birds | ریقنە، پیسایی باڵندە. |
| درقية، غدة درقية | Thyroidgland | لووی سایرۆید، کە دەکەوێتە ژێر ملەوە، هۆرمۆنی سایرۆید دەردەدات کە دەست بەسەر گەشەکردندا دەگرێت. |
| درقين | Thyroxine | (سیرۆکسین)، ئەو هۆرمۆنەی کە لە لایەن لوی سایرۆیدەوە دەردەدرێت. |
| درقس | Dorcus | (دۆرکەس) مێروویەکی بە کەڵکە لە قالۆنچە دەچێت. |
| درکة، خشب الموس | Leather wood | دارپەت، درەختێکە توێکڵەکەی نەرمە پەتی لێ دروست دەکرێت. |
| درم | Anodontia | بێ ددانیی، دەم پووچیی. |
| درمق، درمکة | White flour | ئاردی سپیی، نانی سپیی. |
| درمق | Fingercomb grass | رووەکێکە تۆوەکەی بۆ ئازاری گورچیلە باشە. |
| درموش، زبابة | Shrew | شیرنالی، مشکی دارو درەخت، گیاندارێکە لە مشك دەچێت مێروولەو میش‌و مەگەز دەخوات. |
| درم | | جۆرە درەختێکە پەتی لێ دروست دەکرێت. |
| درماء | Fleshy | قەڵەو، گۆشتن. |
| درماء | | رووەکێکی دەشتەکی‌یە شێوەی لەشێوەی جگەر دەچێت گەڵاکەی سوورو رەشە. |
| درميت | Dermite | (دێرمایت) نەخۆشیی زیپکە ، درمی ئاژەڵ‌و وڵاخ. |
| درن | Dirt- filth | پیسیی، چڵك، کرێش، قرێژ. |
| درنة، عسقل | Tubercle tuber | سەلك، بریتی‌یە لە قەدێکی رووەکی کە لەژێر زەوییدا دەبێت، خواردەمەنیی تیادا کۆ دەبێتەوەو گۆیکەی پێوە دەبێت وەکوو سەلکی پەتاتە. |
| درني | Tuberculous, tuberous | سەلکیی. |
| درن المواشي | Clyers, Clire Angle berry | سیلی ئاژەڵ. |

| | | |
|---|---|---|
| درنفيس، مفك البراغي | Screw driver | جەرپادەر، دەرنەفیس . |
| درنوق، درونج | Doronic | گیایەکە لە هەمیشە بەهار دەچێت. |
| درنكو، ملك الغراب | Drongo, King-Crow | شاقەلەرەشکە، جۆرە باڵندەیەکە. |
| درنوق، خانق النمر | Panther- Strangler Leopards, bane | یوزخنکێن، جۆرێکە لە رووەکی دەرمومنگ گیایەکی ژەهرینە گوڵەکەی زەردە تۆوەکەی رەشە. |
| درواس | Bull-dog | سەگێکی سەرزلە. |
| دروسوفيلا | Drosophilla | (دروزسوفیلا)، جۆرە مێش و مەگەزێکە لەسەر میوەی گەییوو رزیو دەژیو هێلکەی تیادا دەکات. |
| دروسيرا | Drosera | (دروسیرا) جۆرە درەختێکە دەرمانی لێ دەردەهێندرێت دژی کۆکەرەشە، گەڵاکانی مادەیەکی لینج دەردەدەن مێش و مەگەز دەگرن. |
| دروكولي | Douroucouli | (دروکۆلی) جۆرە مەیمونێکی بچووکە، کلکەکەی درێژو تیسکنە. |
| درويلة | Diervillea | (دیرڤیلیا) رووەکێکە گوڵەکەی لە رەحەتی دەچێت. |
| درهم (عملة) | Drachm | پەنجایی، پەنجا فلس، درهەم. |
| درهم (وزن) | Dram | ٨٨و٣ گرام ، (٦٠) دەنکە گەنم -١٢/١ ی وەقیلە. |
| درهم سائل | Dram liquid target | ٦٠ تنۆك، ٦٠ دلۆپ. |
| دريخة | Layer | ئەو لقەی کە قاشوو دەگرێت وەکوو لە داری مێودا. |
| دريجة، درجة | Knot, Dunlin Sanderling | باڵندەیەکی ئاوییە لە زیقاوڵە دەچێت. |
| درينة، هدف | Target | نیشانە. |
| دريقة | Parlour palm | رووەکێکە لە کۆمەڵەی شلێر لە زەمەق دەچێت گەڵاکانی گەورەو هەمیشە سەوزن بۆ رازاندنەوەی باخچەکان دەروێنرێت. |
| درينة | Tubercle | سەلکۆکە، (وەکوو سەلکۆکەی روەك) گرێ، (وەکوو ئەو گرێ رەقەی کە لە سەر ئێسك یان لە ئەندامەکانی لەشدا پەیدا دەبێت). |
| دريل، مثقاب | Drill | بەریمە، سمۆ. |
| دريس | Derris | (دیریس) دەوەنێکی دەشتەکیی کشتووکاڵییە مادەیەکی ژەهر لە رەگەکەی دەردەهێنرێت پێی دەوترێت (رۆتینۆن) بۆ لەناوبردنی مێش و مەگەز. |
| درياس، درست دروس، ادرياس | Drias plant Smooth Thapia | رووەکی درياس، گیایەکی دەشتەکی پزیشکییە گەڵاکەی لە پەر دەچێت گوڵەکەی سپییە مادەیەکی رێسینی (جەوری) سوتێنەر لە رەگەکەی دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکیی. |
| دريمة، خضيرة | Hill mustard, turKish rocket | کووزەڵەی تورکیی، گیایەکە قەدو گەڵاکەی توکنە لەناو کێڵگەو مێرگدا دەروێت بۆ لەوەڕی ئاژەڵ باشە. |
| دريمس، دريميد | Drimys | (دریمس)، دارو دەوەنێکی هەمیشە سەوزە گوڵی جوان دەگرێت، توێکڵەکەی بۆنخۆشە مادەیەکی رێسینی لێ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکیی. |
| دزيور | Dasyurus | (داسیوز) گیاندارێکی شیردەری توورەکەداری درندەیە. |
| دسار، كويلة | Dowel | بزماری دووسەر. |
| دساس، دفانة، نكاز | Sand boa, Eryx | ماری لم ، مارێکی بێ ژەهرە سەرو کلکی باریکە لەژێر لمدا دەژی رەنگەکەی زەرد سوورە. |
| دساسة، سبس، دفانة | Seps | مارمێلکەی لم، جۆرێکە لە مارمێلکە خۆی لەناو لمدا نوقم دەکات. |
| دسام | Emery-stopper | سەرقاپێك لە شووشە بێت. |

| | | |
|---|---|---|
| دسام، صمام | Valve | زمانە، دەمەوانە. |
| دسام، فتيل الجرح | Suppurative Dossil | پلیتەی برین، پلیتەیەکی دەرمانلاوییە دەخرێتە دەمی برینەوە. |
| دسبوس، قرمزية | Kermes, Diaspis | قرمز، مێروویەکی زیان بەخشە بە رووەك. |
| دسبيرس | Diospyros | (دایوسپیرۆس) جۆرە دارو دەوەنێکە لـە کۆمەڵـەی ئەبەنۆس تەختەکـەی قورس و سەخت و مەیلەو رەشە. بەرەکەی لە ترێ دەچێت تامەکەی توونە. |
| دست، مرجل | Cupola, Boiler Caldron | قازان، مەنجەڵی گەورە. |
| دستمبر، ديستيمبر | Distemper | ١- سەگەناز، نەخۆشییەکی درمە بەزۆری تووشی دەماری سییەکان و ریخۆڵەی سەگ دەبێت.<br>٢- دەیستەمبەر، جۆرە بۆیەیەکە سریشی تێ دەکرێت لە جیاتیی رۆن. |
| دستور، قانون | Statue, Constitution, Code, Rule | دەستوور، رێباز، یاسا، رێسا. |
| دستة | Dozen | دەستە، دەرزن. |
| دسر | OaKum | ریشاڵی دەرمانلاویی بۆ چارەکردنی برین. |
| دسر | Wedge | پواز، مێخ. |
| دسكرة | Small village, Hamlet | دێیەکی بچووك، گوندێکی بچووك. |
| دسم | Fat, greasy, Adipose | چەور. |
| دسميات | Lipides | چەورییەکان، رۆنەکان. |
| دسمان | Duck bill, platypus | مشکەکوێرەی ئاویی، دەنووکە مراویی، گیاندارێکی هێلکەکەری شیردەری ئاوییە لە مراوی دەچێت. |
| دسمة | Brown | رەنگێکی بۆری مەیلەو رەش. |
| دسنطاريا، ديزانتري | Dysentery | زەحیریی، دیزانتری، سك چوونی خوێناویی. |
| دسيع | Basis of neck | بنکی مل، شوێنی پەیوەندی مل بە سنگەوە. |
| دسيسة،(افسنتين، شيح رومي | Reg weed, worm wood | (ئەفسەنتین)، گیایەکی بۆنخۆشە ئاوکەکەی دەکرێتە مەیەوە. |
| دسيسة، مكيدة | Piot | تەڵەکە، فێڵ. |
| دش، دوش | Douche | دووش، رەمێڵە. |
| دشبد، كنب | Callus | گرێ لە ئێسکدا لە ئەنجامی سارێژبووی شکاوی ئێسك. |
| دشلوش | Dichillus | (دەشلووش) جۆرە قالۆنچەیەکی بچووکە. |
| دشمة، انثراكنوز | Anthracnose Gnomonia | (ئەنسراکنۆز) جۆرە کەرووێکی زیان بە رووەك دەبەخشێت. |
| دشيرة | Dasychira | (داشیرە) مێروویەکی زیان بەخشە بە رووەك. |
| دشيشة، برغل | Porridge of crushed wheat | ساوەر، گەنمی کوڵاوی وشك کراوەی هاڕراو کە بۆ چێشت بەکاردێت. |
| دعارة، دعر | Immorality, License, debauchery | بەدڕەوشتیی، داوێن پیسیی، قەحبەیی. |
| دعامة | Support, Stay | پایە، پاڵپشت، کۆڵەکە. |
| دعامة، خلية دعامة | Basidium | خانەی کۆڵەکەیی، خانەی سەرەوەی لەشی قارچك کە سپۆری تیادا پەیدا دەبێت. |
| دعامة الحائط | Wall prop | خەرپشت، پاڵپشتی دیوار. |
| دعابة، دعبوب، دعاع | Winged Black-ant | مێرووڵەی رەشی باڵدار. |

| | | |
|---|---|---|
| دعاية | Propaganda | پرۆپاگەندە، بەندوباو. پڕوپەلانتا. |
| دعبل | Bead | هەڵمات، غارە، کەلا، مات، تەبەل. |
| دعبل | Frog-Spawn, Eggs of frog | گەرای بۆق. |
| دعبوب | Short-slim winged black ant | ١-پیاوێکی لاوازی کورتە بالا.<br>٢-مێرووڵەی رەشی باڵدار.<br>٣-جۆرە دانەوێڵەیەکی رەشە بۆ خواردن بەکاردێت. |
| دعث | Chill, Shivering | موچڕك، تەزوو، لەرز، تەزینك. |
| دعث توعك | Malaise | هەست کردن بە نەخۆشیی و بێ ئارامیی. |
| دعث | Epiphyty | نەخۆشیی و چارەکردنی روەك بە دەرمان. |
| دعر، دعرة | Grub of zeuzera | هاڕێ، مۆرانەی تەختە، تەختە کالۆس جۆرە کرمێکە تەختە دەخوات. |
| دعس، کابوك | Cabbage wood Cotton tree | داری لۆکە، داری کەلەرم، درەختێکی گەورەیە بەرەکەی لۆکەی تیادایە. |
| دعس | To treadupon | فلیقاندنەوە، پلیشاندنەوە. |
| دعسوقة، ابو العید، بنت العید | Lady bird Coccinella | کوێرمکە سوورە، خاڵخاڵۆکە، خاڵخاڵان، جۆرە مێروویەکی زیان بەخشە بە قەد مێشێك دەبێت رەنگەکەی سووری مەیلەو پرتەقاڵییە، خاڵی رەشی پێوەیە. |
| دعك | To rub | گلۆفتن، هەڵ گلۆفتن، گلۆفتنەوە، فلیقاندنەوە، هەڵ فلیقاندن، هەڵ گلۆفاندن. |
| دعکر | Pomacanthus | جۆرە ماسییەکە. |
| دعلج، نیص، شیهم، دلدل | Porcupine | سیخۆڕ، دلو، سووچەر، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە. لەشی بە درك داپۆشراوە، درکەکەی دەگرێتە دوژمن. لەناو چاڵی ژێر زەویدا دەژی گۆشتەکەی دەخورێت. |
| دعم | Supporting | پەساردن، هەڵپەساردن، پشت گرتن، پشتگیری کردن. |
| دعموص، شرغوف | Tadpole, larva | سەرە مێکوتە، بەچکەی بۆق. |
| دعوی، قضية | Action, lawsuit, Suit , Case | داواکاری. |
| دعوة، عزومة | Invitation | داوەت، داواکاری. |
| دعیرة | | جۆرێکە لە کەڕوو زیان بەخشە بە رووەك. |
| دعویقة، صعوة | Kinglet Wren | چۆلەکەی زەیتونیی، جۆرێکە لە چۆلەکە رەنگەکەی زەیتونییە. |
| دغام | Pharyngitis | سوتانەوەی گەروو، ئاوسانی گەروو. |
| دغیز، خرشنة صغیرة | Little tern | پەرسێلکەی دەریایی پچووك، جۆرێکە لە پەرەسێلکەی دەریایی لەشی سپییە باڵەکەی خۆڵەمێشیی و شینە سەری رەشە، دەنووکی زەردە، لاقی پرتەقاڵییە. |
| دغدغة | TotickLe | ختووکە، ختکە، قدیکە. |
| دغر | Dermatea | (دێرماتیا)، جۆرە کەڕوویەکی زیان بەخشە بە روەك. |
| دغش، دغیشة | Dusk, Twilight | خۆرئاوا، زەردەی هەتاوپەر. |
| دغفل | Young elephant | بێچوە فیل. |
| دغل | Thicket | پەرژینی وشك. |
| دغل(ادغال) | Weed | کژ گیا. |
| دغل، شجر کثیف | Jungle | دارستان، جەنگەڵ. |
| دغناش، زمیر | Trumpeter Bullfinch | جۆرە چۆلەکەیەکی رەنگاو رەنگە کرمو مێرو دەخوات. |

| | | |
|---|---|---|
| دغيلة | | جۆرە کەرووێکە زیان بەخشە بە ڕوەك. |
| دف، طار | Tambour, Tamourine, Timbrel | دەف،گەوال، هەلاّل، ئامرازێکی مۆسیقایە. |
| دفء | Warmth, heat | گەرمیی. |
| دفاع | Defence | بەرگریی. |
| دفاع مدني | Civil defence | بەرگریی میللیی، بەرگریی گەل، ڕاهێنانی میللەت بۆ پاراستنی وڵات بە هاوکاریی هێزە چەکدارەکان. |
| دفاسة | Oryx, Antelope | جۆرێکە لە مانگا کێوییی. |
| دفان، راقود | | جۆرە ماسییەکی تەشیلەییی دەریاییە. |
| دفاء مدفاة | Stove | زۆپا، سۆپا. |
| دفة المركب، دفة العربة | Rudder | سوکان، سوکانی ئۆتۆمبێل. |
| دفة الباب او الشباك، درفة | Leaf of adoor, window shutter | چوارچێوەی دەرگا. |
| دفة الحائك | Weaving-Rudder | شانەی جۆلاّ، ، دەفەی جۆلاّ، شەپۆتە. |
| دفتر، كراسة | Copy-book, Note-book | دەفتەر، پەڕاو، پەرتووك. |
| دفتر احسابات، سجل | Register | دەفتەری ژمێرە، دەفتەری ژمێریاریی. |
| دفتر الصندوق | Cash-book | دەفتەری پارە وەرگرتن. |
| دفتريا، خانوق، خناق، ذباح | Diphtheria | وەناق، نەخۆشییەکی میکرۆبیی درمە لە گەروودا دەبێت. |
| دفتريا الطيور | Variolic-diptheria, pip | ئاوڵەی باڵندە، وەناقی باڵندە، نەخۆشییەکی پیسە. |
| دفدوف | Heniochus | دەفۆکە، ماسییەکی دەریایی بچووکی شێوە خڕی قوپاوی ڕەنگینە، پەرەکەیەکی درێژی باریکی کەوانەیی هەیە. |
| دفر، زفر، خبيث الرائحة | Stinking, fetid | بۆگەن. |
| دفرة، مالج | Trowel | ماڵەی بەنا. |
| دفران، عرعرنووي | Nuclear Juniper | عەرعەری ناوکیی، هەڤرێسکی ناوکیی، جۆرێکی جوانە لە درەختی هەڤرێسك زۆر بەرز دەبێتەوە گەلاّکەی پانە. |
| دفراء، دفر | Scoparia | گیایەکە گوڵەکەی بچووکە بە زۆریی سپیی یان شینە یان زەردە. |
| دفع | Repultion, Impulse, Repellence | پاڵنان، پاڵ پێوەنان. |
| دفع، نفثي، دفع نافوري | Jet propulsion | پاڵنانی جێتیی، وەکوو دەرپەڕینی فڕۆکە(فڕۆکەی جێت)، بۆ پێشەوە لە ئەنجامی دەرپەڕینی دووکەڵ (گازە سووتاوەکان) لە پشتەوەی. |
| دفعة عصبية | Nerve-impulse | پاڵنانی دەماریی، بریتییە لە گۆڕانێکی یەك لە دوای یەك لە ڕیشاڵی دەماریدا ڕوودەدات لە ئەنجامی وریاکردنەوەی بە یەکێك لە وریا کەرەوەکان باوەڕ وایە کە ئەم پاڵنانە سروشتێکی کارەبایی هەیە. |
| دفعة | Once, Batch | جار، نۆرە. |
| دفق، تدفق | Effusion, pouring, Influx | هەڵ قوڵان، دەرپەڕین، لافاو، لێشاو. |
| دفق، انزال | Ejaculation | ئاو هاتنەوە، پیاوێك ئاوی بێتەوە. |
| دفلة،دفلي، حبن، حبين، سم الحمار | Rose-bay Oleander | ژاڵە، ڕوڵك، کەرکوژە، خەرزاڵە،ڕوێل، دەوەنێکی هەمیشە سەوزە گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی سپیی یان زەرد یان پەمبەیی، هەموو بەشێکی ژەهرە چونکە(ئولیاندرین) و (ڕۆساجنین)ی ژەهریی تیادایە، بۆ پەرژین و ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت. |
| دفن، طمر | Burial, Interment, Burying | ناشتن، خستنەچاڵ، قەشارتن. |

| | | |
|---|---|---|
| دفنة، مازريون | Dwarf laurel Daphne | تورز، روەكێكی ژەهرینە. |
| دفين | Buried | شاراوە، نێژراو، ئەشارتیی. |
| دفينة | Treasure-trove | غەزنە، گەنجینە، خەزێنە. |
| دفيئة، بيت زجاجي | Garden-glass, Glass-house, Green- house | خانووی شووشە، دەزگای نوخشە، دەزگایەکە بۆ پێگەیاندنی نوخشەی سەوزەو میوە بەر لەکاتی تایبەتیی خۆی لەناو خانووی شووشەدا. |
| دق، سحق | Powdering | هارِین، کوتان. |
| دق الأرض | Toram, beatdow | پاکوت، پێ شێل. |
| دق ، طرق | Knocking | لێدان، لێدانی دەرگا. |
| دق، قرع | Ringing | لێدان، لێدانی زەنگ. |
| دق النبض | Pulsation | لێدان، پرتە،پرتەی بۆری خوێنبەر. |
| دقاق | Knocker | کوتەر، بکوت، لێدەر. |
| دقاقة | Pounder | (١) دیبەگ، دنگ، کوتك، تەپان.<br>(٢) دارێکە سەرێکی پانی هەیە، زەوی‌و سەربانی پێ دەکوترێتەوە. |
| دقة، قرعة | A knock | لێدانێك. |
| دقة القلب | Heart beat | لێدانی دل. |
| دقة | Fineness, Thinness | وردیی، باریکیی، زراڤبوون، هیریی. |
| دقة | Accuracy | وردیی، دووربوون لە هەڵەوە. |
| دقة الأداء | Fide-lity | ئامرازێکی وەکوو رادیۆ بە باشی ئیش دەکات. |
| دقتمون | Fraxinella | (فراکسینیلا)، گیایەکی پزیشکییە گوڵەکەی بۆن خۆشەو ئەرخەوانیی‌یە. |
| دقران | Trellis | دالێت، دالووت، چێوپەسی، کەپر. |
| دقرة | Lock | کلۆمی دەرگا. |
| دقسة، قدان | Flee-beetle | جۆرە قالۆنچەیەکی زیان بەخشە بە رووەك. |
| دقشوم | Rubble, Brickbats | وردە بەرد، پارچە خشت. |
| دقل، صاري | Main mast | تێلا، تێلای ناوەراستی کەشتی کە چارۆکەکەی بە سەردا دەدرێت. |
| دقماقة ، مدقة خشبية | Mallet | چوکوش تەختە. |
| دقماقة | Bagrus-Docmac | ماسی‌یەکی رووبارییە. |
| دقناش، صرد، تمس | Shrike | باڵندەیەکی چالاکە لە چۆلەکە گەورەترە، مێروو دەخوات. |
| دقيش | Tanysipterta | باڵندەیەکە سەرو باڵی شینە مل‌و پشتی رەشە کلکی درێژە. |
| دقيق | Fine, Accurate | ورد، وردکە، ورتکە، هویرك، زراڤ. |
| دقيق، طحين | Flour | ئارد. |
| دقيقة | Minute | خولەك، یەکەی پێوانی گۆشە دەکاتە ١/٦٠ ی پلەیەك، هەروەها یەکەی پێوانی کات (وەخت) وە دەکاتە ١/٦٠ی کاتژمێرێك، واتا (٦٠) چرکە. |
| دقيقة، جسيمة | Particle | وردیلە. |
| دقيقة بيتا | Beta-particle | وردیلەی بێتا، تەنۆکەی بێتا، بریتی‌یە لە ئەلەکترۆن کە خێرایی‌یەکەی نزیکەی بە خێرایی رووناکیی. |
| دقيقة الفا، جسيمة الفا | Alpha-particle | وردیلەی ئەلفا، تەنۆکەی ئەلفا، بریتیە لە ناوکی ئەتۆمی هیلۆم‌و کارەبای موجەبی لە سەرە چونکە دوو ئەلیکترۆنی ون کردوە. |

| | | |
|---|---|---|
| دك، هدم | Demolition | رووخاندن، رماندن، هەرفاندن.رماندن. |
| دكان، حانوت | Shop | دووكان، كۆگا. |
| دكاع | | نەخۆشی‌یەكە لە سنگی ولاغ و وشتردا دەبێت. |
| دكاكة، متك | Badkin | داردۆخین، پارچە دارێكە دۆخینی پێ تێپەڕ دەكرێت بە شوێنی خۆیدا لە دەرپێ و شەرواڵدا. |
| دكاكة الأرض، مندالة | Rammer | زەویی كوت، ئەو ئامرازەیە كە زەویی پێ دەكوترێتەوە. |
| دكة | Balast | سەكۆ، تەلان، دۆشك. |
| دكة السروال، تكة | Running band | بەنەخوێن، دۆخین. |
| دكتيل | Dactylis, Cocks fat | گیایەكە لە كۆمەڵەی دەغڵ و دان بۆ لەوەڕ باشە. |
| دكتور (في الطب)، K حكيم | M . D, Doctor | دوكتۆر، دوختۆر. |
| دكتوراه | Doctorate | (دوكتۆرا)، بڕوانامەیەكی پسپۆرییە. |
| دكنة، كمدة، كلاح | lividity | خوێن تێزان، شین بوونەوەی پێست لە ئەنجامی لێدانەوە. |
| دكن، ادكن | Blackish | مەیلەو ڕەش. |
| دلاء | Pendicle | پەتی ئاو هەڵكێشان، پەتی ئاو هەڵێنجان. |
| دلاق، قطيفة، جميلة | Wildbeet | گوڵە قەیفە، گیایەكی ڕازاندنەوەیە گوڵەكەی سوورە. |
| دلال، غنج | Coquetry | ناز، عیشوە. |
| دلاع، رقي، خربز، حبحبة، بطيخ أحمر | Water melon | شووتی، شفتیی. |
| دلاع، دولعة | Strombus, Wingshells | (١) جۆرێكە لە گیانداری گوێچكە ماسی خۆی دەنووسێنێت بە بەردەوە لە دەریادا دەژی، سەدەفی هەیە بۆنی خۆشی لێ دەردەهێنرێت. (٢) سەدەف، لەپكە، قاوغ، گەوهەربارە، گەوهەردان : پەیكەرێكیی سپیی یان پەمبەیی سەختی بریقەدارە. |
| دلال،سمسار | Broker, public, Crier | دەلاڵ، جارەچیی. |
| دلالة، سمسرة | Auction, brokery | دەلاڵی ، جارچێتیی. |
| دلالة، بينة | Direction, proof | بەڵگە. |
| دلاية القلادة، مجول | Pedant | پەتی ملوانكە، زنجیرەی ملوانكە. |
| دلاة جليدية | Icicle | چلوورە، چلوورەی سەهۆڵ. |
| دلانية | Dillenia | (دیلینیا)، درەختێكە بەرەكەی لە ترێ دەچێت، بەڵام ناخورێت. |
| دلب، دلبة، صنار، جنار، شنار، دلبة، شرقية، ضرام، عيثام | Oriental-plane tree platan | سوورەچنار، بەلگ، درەختێكی گەورەیە لە قەراغ ئاوو سەرە ڕێدا دەروێت بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە هەروەها سود لە تەختەكەی وەردەگیرێت بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە هەروەها سوود لە تەختەكەی وەردەگیرێت بۆ دروست كردنی كەل و پەل، گەڵاكەی لە گەڵای گەرچەك دەچێت. |
| دلب هندي ، ساج | Teak-tree, Indian oak | ساج، سوورەچناری هیندیی، درەختێكی گەورەیە. |
| دلبوث، سيف الغراب | Gladiole, Cornflag, Swordlily | شالانگ، شمشێری قەلەرەش، ڕوەكێكە لە زەعفەران دەچێت، گەڵاكەی لە شمشێر دەچێت، ڕەنگێكی سووری تێر یان بنەوشەیی هەیە بۆ ڕازاندنەوەی باخچەكان دەروێنرێت. |
| · | Delta | (دێلتا) میان دواو، زەویی نێوانی دوو لقی دەریایەك یان ڕوبارێك كە لە نیشتنی قوڕو لیتە بە شێنەییی پەیدا دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| دلتا قیفاوي | Cepheid-Variable, Cepheus | (سیفۆس)، ئەستێرەیەکە پرشنگەکەی بەرێکەو پێکی دەگۆرێت دەمێك زیاد دەکاتو دەمێك کەم یەك لە دوا یەك. |
| دلة قهوة | Coffee-pot | جەزوەی قاوە. |
| دلدولة | Pedant | شتێکی هەڵواسراو. |
| دلدل | | راجع (دعلج). |
| دلفان، غرين | Loam | قوڕ، لیتە. |
| دلف، دلوف | Laphates | جۆرە داڵێکی پۆپنەدارە رەنگەکەی رەشە چاوو لاقی زەردن. |
| دلفين | Dolphin, Delphinus | (دۆلفین)، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| دلفين، دخس، تخس | Dolphin | (دۆلفین)، جۆرە نەهەنگێکە، درێژییەکەی نزیکەی(٢) مەتر دەبێت، خێرا مەلە دەکات، دەتوانێت باز بدات، زوو ماڵیی دەکرێت. |
| دلق،خز، سنسار، سنار | Marten, beach-marten | دەڵەك،کووزە، گیاندارێکی گۆشتخۆرە بە قەدەر پشیلەیەك دەبێت رەنگەکەی قاوەییە ژێر ملو سکی سپییە پێستەکەی بە نرخە باڵندەی بچووك دەخوات. |
| دلك | To-massage, Sclage, Scour | شێلان، دەست پیاهێنان، لێ خستن، لێ خشاندن، ساوین. |
| دلك، جاف | Xerotripsis | شێلانی وشك. |
| دلك بالمرهم | Embrocktion | هەنوون، شێلان بە مەلهەم. |
| دلكة | Evania | (ئیڤانیا) مێروویەکە لەسەر سیسرك دەژی. |
| دلم، فيل | Elephant | فیل. |
| دلم | Stock, dove | کۆترە کێویلە، گاکۆتر. |
| دلو | Bucket | دۆلکە، دۆڵچە، سەتل، پەقرەج، زرك. |
| دلو جلدي | Skin-bucket | جەومندە، جەومنگە. |
| دلوق، سويدة | Sea blite, African Salsola | گیا سۆدە، گیایەکە گوڵەکەی سەوزە سۆدەی لێ دەردەهێنرێت. |
| دلوك | Embrocation Ointment | دەرمانی هەنوون، هەر دەرمانێك (مەڵحەمێك) بۆ شێلانی واتە هەنوونی لەش بەکاربێت. |
| دلو، ساكب الماء، ساقي | The water- man , Aquarius | دۆلکە، ئاوڕژێن، یەکێکە لە کەلوەکانی (بورج) ئاسمانی. |
| دلهات | Lion | شێر. |
| دلهقان | Saffron | زەعفەران، رووەکێکە گوڵەکەی پرتەقاڵییە. |
| دلهم، اسود | Black | رەش. |
| دلهم | Sandgrouse | قەتێ، جۆرە باڵندەیەکە. |
| دليل | Sign , Indicator | بەڵگە، رابەر، پێشڕەو، پێشاندەر. |
| دليل كيمياوي | Chemical-Indicator | رابەری کیمیایی، ئەو مادەیەی کە رەنگەکەی لە گیراوەی ترش و تفت و خوێدا بگۆڕێت وە بۆ ناسینەوەی ئەو جۆرە مادانە بە کار بهێنرێت وەکوو رابەری کاغەزی گوڵەبەڕۆژە. |
| دليل، مرشد | Guide | رابەر. |
| دليل، علامة | Sign, Index | نیشانە. |
| دليل موجي | | بەڵگەی شەپۆلی بۆرییەکی کانزاییە بۆ هەڵگرتنی لەوحی لاسلکیی بەکاربێت. |

| | | |
|---|---|---|
| دليل، برهان، حجة | Evidence, Proof | بەڵگە، سەلماندن. |
| دليل بحري | | بەڵگەی دەریایی. |
| دليل السفن والطائرات | Pilot | رابەری پاپۆڕو فڕۆکە. |
| دليل المناحل | Honey guide | هەنگ دۆز، رابەری هەنگوین، جۆرە باڵندەیەکە شانەی هەنگ دەدۆزێتەوە. |
| دليل اتجاه الريح، دوارة، ديك الرياح | Wind-Vane, Weather-CocK | بانما، باپێو، کەڵەشێری با، رابەری با، ئامرازێکە لە شێوەی کەڵەشێردا لە سەرنووکیی شیشێك دانراوە بۆ پیشاندانی ڕێ ڕەوی با. |
| دليك، توت الثعلب عليق | Hip, Bramble, Black berry | (١) توترك، تودری، دەوەنێکی خشۆکی دڕکاوییە بۆ پەرژین بەکار دێت بەرەکەی لە توو دەچێت بچووکترە سوور یان ڕەشە دەخورێت. (٢) بەری ڕوەکی نەسرین کە سوورە شیرینە دەخورێت. |
| دليل باير | Bayers-indicator | رابەری بایەر، دەنکە حەبێکە بۆ زانینی رادەی ترشێتیی شیر بەکاردێت. |
| دليل القافلة | Caravaneer | کاروانچیی. |
| دليل امدصاص دلائل امدصاصية | Adsorption indicator | رابـــەرە مژپووایـیـــەکان، ئـــەو مادانـــەن کـــە لـــە ڕووی مـــادە نیشـتووەکانەوە دەمژرێـــن و ڕەنگەبنەرەتیەکـەیان دەگۆڕێـــت وەکـــوو فلۆریین و ئایۆسین. |
| دم | Biood | خوێـن، خـوون، خـین، هـوون، شـلەیەکی سـوورە لـە لەشـی گیـانداردا دەسووڕێتەوە. |
| دم العاشق، مخلدة | Globe-Amaran- thus | جۆرێکە لە ڕوەکی گوڵە قەیفە. |
| دم الأخوين، شجرة التنين، عندم، توز مخزني | Tubipora- musica , dragon gum tree | خوێنی دوو براکە، درەختی ئاژدیها، بەقەم، درەختێکی گەورەیە گوڵەکەی سپیی مەیلەو زەردە، ئاوکێکی سووری لێ دەردەهێنرێت، تەختەکەی سوورو نایابە، جۆرێکە لە داری شیلان. |
| دم التنين، دم الثعبان، قاطر | Dragontree | خوێنی ئاژدیها، خوێنی مار، دارو دەوەنێکە لە دارخورما دەچێت گوڵەکەی سپییە، بەرەکەی لە گێلاس دەچێت پرتەقاڵـیی یـان سـوورە، ئاوکێکی زەمقی سوور لە قەدەکەی دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پیشەسازیی. |
| دم اسود | Melanemia | خوێنەڕەشە، بوونی مادەیەکی ڕەش لە خڕۆکە سوورەکانی خوێندا. |
| دم الغزال، كرسفية حمراء | Redcud-Weed | خوێنی ئاسك، گیایەکی پزیشکییە گوڵەکەی سوورە. |
| دم النعمان، ادونيس | Adonis | (ئەدۆنیس) گیایەکە گوڵـی سوور دەگرێت. |
| دمار | Ruin, Destruction | لەناوچوون، ڕووخان، کاول بوون. |
| دمام، طلاء | paint, Varnish, pigment | بوویە. |
| دمالي | Stable Litter | دۆشەکی ئاژەڵ، ڕاخەری ئـاژەڵ، ئـەو پـووش و پەلاشـەی کـە لـە گـەوڕ و تەویلەدا ڕادەخرێت بۆ ئەوەی ئاژەڵ لەسەری بکەوێت. |
| دماغ | Encephalon, Brain | مێشك، ئەندامێکی دەمارییە لەناو کاسەی سەردا بریتیە لە سێ بەشی، مەژی و مێشکۆکەو مەخزی لاکێشەیی، هەریەکە فرمانی خۆی هەیە. |
| دماغي | Cephalic, Encephalic | مێشکیی، پەیوەندی هەبێت بە مێشکەوە. |
| دماس | Diclidorus | جۆرێکە لە شەمشەمەکوێرە. |
| دمال، دمان | Dung | پەین. |
| دمان، وبر، طبسون، زلم | Daman | (دامان)، کورکن، گیاندارێکی شیردەری قرتێنـەرە لـە کەروێشـك دەچێـت سمی هەیە. |
| دماع | Lactescent | (١) هەر ڕوەکێك ئاوك بدات. (٢) گرینۆك: هەر منداڵێك زۆر بگری. |

| | | |
|---|---|---|
| دماع | Tearful | (١)هاتنه خوارەوەی فرمێسك بە لێشاو لە چاوەوە لە ئەنجامی بیریی یان نەخۆشی‌یەوە. (٢) هاتنە دەرەوەی ئاوك لە كاتی بڕینەوەی لقی دارمێودا لە بەهاردا. |
| دمة، جلطة | Ciot | قەتماغە، قەتماغەی خوێن. |
| دمة، قملة | Louse | ئەسپێ، مێروویەكی زیانبەخشە. |
| دمة، قط، هر، بس، سنور، سنار، خيدع، خيطل، ابو غزوان، بزون. | Cat | پشیلە، كتك، گوربە. |
| دمدامة، بطاطا، حلوة | Sweet potato | پەتاتەی شیرین، گیایەكە گەڵایەكی سەوزی خڕی بچووكی هەیە ڕەگەكەی سپی‌یە لە گێزەر دەچێت زۆر شیرینە گۆیكەیەكی پێوەیە لە پیاز دەچێت. |
| دمدمون، خمان، بيلسان اسود، خابور، سبوقة | Boon-tree, Elder-tree, Arn-tree | بەیلەسانە ڕەشە، جۆرێكە لە داری بەیلەسان گوڵەكەی بۆنخۆشە بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| دمجانة، باطية | Carboy, Demljohn | قاپێكی یان سوراحی‌یەكی شووشەییە پووشی تێوە پێچراوە شەڕابی تێ دەكرێت. |
| دمدمة | Grumble | پرت‌و بۆڵ،بۆڵە بۆڵ، گرماندن، مرەمر. |
| دمر | Damar, Dammar, Dammer | (دامر) مادەیەكی زەمقی‌یە (جەویی) لە هەندێك داری سنەوبەر (كاژ) لە ئوسترالیا دەردەهێنرێت لە دروستكردنی وەرنیش‌و مەرەكەبدا بەكاردێت. |
| دمراء | | مەڕی كەم شیر. |
| دمسي، جربيل | Gerbil | (جەربیل) گیاندارێكی شیردەری قرتێنەرە لە مشك دەچێت. |
| دمسيس، امبروسيا | Sea ambrosia | مەتری دەریا :- گیایەكی دەشتەكی‌یە بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| دمسيسة، ابسنت، افسنتين، خترق، شيح رومي | Worm wood, Absin thium, Absinth | (ئەفسەنتین) گیایەكی دەشتەكی‌یە، گەڵاكەی لە پەڕ دەچێت بە شێوەی هێشوویەكی بۆنخۆشە ڕۆنێكی لێ دەردەهێنرێت، هەروەها مادەیەكی لێ دەردەهێنرێت بۆ دروستكردنی دەرمان‌و مەی. |
| دمع (دموع) | Ears | فرمێسك ، ئەسرین، ئەشك، ڕۆندك. |
| دمعي | Lacrimal | فرمێسكیی، پەیوەندی بە فرمێسكەوە هەبێت. |
| دمعان | Guttation | ئاوڕنگ دەردان: دەرمانی ئاو بە شێوەی ئاورەنگ لە لەشی ڕوەكەوە. |
| دمع ايوب، اودريان، بدر انج | Gromwell-reed, jobs tears | فرمێسكی ئەیوب، گیایەكی درێژی دەشتەكیی پزیشكیی ناوچە گەرمەكانە بەرەكەی بچووك‌و سپیی یان خۆڵەمێشیی یان قاوەییی‌و ڕەقە تەزبیحی لێ دروست دەكرێت، بەری هەندێك جۆری دەخورێت. |
| دمغة، وسم | Brand, stamp | دامغە، تامغە. |
| دمق، عاصفة ثلجية | Hall storm | باسریشك، ڕەشەبای بەفراوی، بەفرو باران بە باوە، كڕێوە، باوبۆران، شلێوە، باروڤە. |
| دمقس | Damask | ئاوریشمی سپیی. |
| دمل، خراج | Abscess, Boil, carbuncle furuncle | دوومەڵ، قونێر، ئاشین، كونێر، پرزك، كولك، كوان. |
| دمل الأربية | Bubon panus | خەیارە، دوومەڵیی پەنا ران. |
| دمل الشرق، بثرة شرقية، حبة بغداد، قرحة شرقية، اخت | Oriental sore | كانی خورما، نەخۆشی‌یەكی درمەزییكە لەسەر دەمو چاو دەست‌ؤ قاچ پەیدا دەكات دوایی كێم دەكات‌و چاك دەبێتەوەو ژێرەكەی بە چاڵی دەمێنێتەوە. |
| دمل الجفن، شحاذ العين | Hordeolum, Sty | قنچكە، سیچكە سڵاوە، بیتك، باپشكێو، دوومەڵێكە لە گۆشەی ناوەوەی چاودا پەیدا دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| دملوك، دملج | Bangle, Armlet | بازن، خلْخاڵ، پاوەنە. |
| دملوج رسوبي | | پارچە بەردێکی نیشتووە وەکوو چەو وایە هەندێکی رەنگاو رەنگە. |
| دملوح | Anthops | جۆرێکی زلە لە شەمشەمەکوێرە. |
| دملوك | | بەردێکی خڕی ساف. |
| دملوك، شيلاك | Shellac | دەمەلۆکە، بریتییە لە لۆکی پاڵێوراویان گیراوەی لۆك لە سپیرتۆدا، لۆکیش مادەیەکی رێسینی (جەویی) یە لە لەشی هەندێك مێرووەوە دەردەدرێت. |
| دمن الجذور | | جۆرە کەڕوویەکە زیان بە رووەك دەبەخشێت. |
| دمنة، دمان | Dungheap | سەرە نوێلك، شوێنی کۆمەڵ کردنی پیسایی ئاژەڵ بۆ ئەوەی کە ببێت بە پەین. |
| دموي | Bloody, Hemal, Hematic, Hemato | خوێن، خوێنین، خوێناویی. |
| دمية، (عروسة) | Doll | بووکەشووشە، بووکە سەماکەرە،بیچبیچە خانم. |
| دمية بط قطبي | Scoter | مراویی پۆڵیی، جۆرە مراویەکە لە ناوچە پۆڵییەکاندا دەژی. |
| دميص، وريق جبلي | Wildbetony, Dryas, Avens | درياسە کێویلە، گیایەکی ریشاڵدارە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| دميكة، زهرة الثلج، زهرة اللبن | Purification | گوڵەبەفر، گوڵەشیر، رووەکێکی پیازییە لە کۆمەڵەی نێرگز. |
| دميري | | سەڵتە، پەستەك، جۆرە جلو بەرگێکە. |
| دميري شمام | Muskmelon | کاڵەك، گندۆرە. |
| دميم، قبيح الشكل | Ugly | ناشرین. |
| دن، خابية، راقود | Great Vessel, Vat Tun, Cask | خوم، کوپەی گەورە. |
| د . ن . أ | Deoxy-ribonucleicacid D . N . A | ترش دیۆکس رایبۆینو کلیك، مادەیەکی پرۆتینی ئاڵۆزە لە ناوکی خانەی زیندەوەردا هەیە، باوەڕوایە کە ئەم مادەیە سیفەتی زگماکی لە نەوەیەکەوە دەبات بۆ نەوەیەکی تر. |
| دنان، دندن، دخين، دهنان، دنيبة، ذنيبة | Tungle-rice, Watergrass Millet-rice, Strink grass, Barnyard grass, Smallmillet, Hedge hog-grass Hedgohag-grass | داروجان، گیایەکە لەناو کێڵگەی برنجدا دەڕوێت بەرەکەی وردو خڕو مەیلەو زەردە. |
| دنتاليوم | Dentalium | (دەنتالیۆم) گیاندارێکی نەرمی قاچ بەلەمی ساکارە لە دەریادا دەژی. |
| دنة | | جۆرە مێروویەکی درێژکۆلەیە لە قالۆنچە دەچێت. |
| دنج | Propolis, Beegl Ue | سرێشی، هەنگ، مێو. |
| دنجة، حمى الدنج | Break bone, Dengue | (تای دێنج)، تایەکی ناو بەناوە. |
| دنجو، دنكو، ذنب استراليا، دنغ، دنغو | Dingo | گورگی ئوستورالیا، سەگی ئوستورالیا جۆرە گورگێکی زۆر درندەیە لە سەگ دەچێت لمۆزی پانەگوێچکەی کورتە تیسکنەرەنگەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە لە ئوستورالیا دەژی. |
| دندرمة، بوز، دوندرمة | Ice-Cream | دۆندرمە، دۆڵدرمە، بەستەنیی. |
| دندنة، طنطنة | Buzzing | ویزەویز، وژە وژ، وشە وش. |
| دندي، ديك رومي | | راجع (دجاج هندى). |
| دند، جتروفة، دند الملوك، حب الملوك | Physic-nut, spurge-nettle, Jetropa | گوێزی حەکیم، گوێزی پزیشك، دەوەنێکی قتی جوانە شیراوێکی پزیشکیی لە قەدەکەی دەردەهێنرێت تۆوەکەی بۆ رەوانیی باشە. |

| | | |
|---|---|---|
| دندران، اقاقي، بيقة | Cowvetch, Cracca | گيا مانگا، گيايـەكى شاخانىو دەشتەكىيە گوڵەكـەى بنەوشـەيىيە بـۆ لەوەڕ باشە. |
| دندل، ميمولس | Monkey-Flower | گوڵە مەيمون، گيايەكە گوڵى گەورەى هەمە جۆرە دەگرێت. |
| دنس، قذارة | Uncleanliness, dirtiness | پيسيى، پۆخڵيى. |
| دنغو، دنغ | | راجع (دنجو). |
| دنف، هزال | Marasmus, weakness | لاوازيى، لاوازبونى لەشى مرۆڤ لە ئەنجامى خراپ خواردنەوە. |
| دنف، حرض | Cachexia | لاوازبوونو خراپ بوونى تەندروستى ئاژەڵ لە ئەنجامى نەخۆشيى ترەوە. |
| دنف الكبد، دودة الكبد | Distomum, Cachexia, Liver Fluke | كرمى جگەر، پەپوولەى جگەر، جۆرە كرمێكە لە گەڵاى درمخت دەچێـت لەسەرى جگەرى مەڕو ماڵات دەژىو تووشى نەخۆشى دەكات. |
| دنف عظمي | Osteoclasia | گێڕبوونى ئێسك، گێڕبوونى ئێسقانى مەڕو ماڵات بە هۆى كەميى خوێنى كاليسيۆمو فۆسفۆڕەوە. |
| دنفصة | Eulophida | (ئيلۆفيدا) جۆرە مێروويەكە لەسەر مێرووى ترى وەكوو زەردەواڵە دەژى. |
| دنقة، شيلم، زوان مسكر | Cheet, Darnel | زيزانـە، گيايەكـە لـەناو دەغڵودانـدا دەڕوێـت زيـانى پـێ دەبەخشـێت دەنكەكەى تاڵو ژەهرە. |
| دنقلة، جنكلة، غطاس | Water Ouzel, Dipper | (سيمەر)نوقمۆكە، باڵندەيەكى قەراغ ئاوە بەقەدەر چۆلەكەيەك دەبێت لەشى رەشە بەرسكى سپىيە خۆى لە ئاودا نوقم دەكات. |
| دنكلة، بلشون، مالك الحزين، بيوضي، جحفلة، ارخياوي، أبو العنقاء | Heron | شاهۆ، شينەشاهۆ، باڵندەيەكى رەنگ خۆڵە مێشىيە لە حاجى لەق لەق دەچێت ، لەناو لقى درمختە بەرزەكاندا هێلانە دەكات بۆقو ماسى دەخوات. |
| دنم، دونم | Donum | دۆنم، ٢٥٠٠ مەترى چوارگۆشە. پێوانەيەكە بۆ رووبەرى زەويى. |
| دنو، قرب | Nearness | نزيكيى، نزيك بوونەوە.جيهان گێتيى. |
| دنيا، عالم | World | جيهان،، گێتى. |
| دنيبة | | راجع (دنان). |
| دواء | Drug, Medicine | دەرمان. |
| دواء معرق | Sudorific | دەرمانى ئارەق كردنەوە. |
| دواء سائل | Beverage, drench | دەرمانى شل، ئەو دەرمانەى كە دەدرێت بە گياندارى ماڵيى كراو. |
| دواء منبه | Stimulant | دەرمانى وريا كەرەوە. |
| دواء الحمام، نورة، مزيل الشعر، جموش | Depilatory | داروو، دەرمانيى تووك لابەر. |
| دواء مسكن | Sedative | دەرمانى ئارام دەر، دەرمانى تەسكينيى. |
| دواء طارد للديدان | Vermicide-vewrmifuge | دەرمانى كرم. |
| دواء ملين | Laxative, Deoppilant | دەرمانى نەرم كەرەوە، دەرمانى خاو كەرەوە. |
| دواء قابض | Astringgent | دەرمانى قەبزكردن. |
| دواء منوم | Hypnotic | دەرمانى خەوێنەر. |
| دواء مسهل | Purgative | دەرمانى رەوانيى. |
| دواء مقيء | Emetic | دەرمانى رشێنەرەوە. |
| دوائر ساعية | Hour circles | بازنە كاژمێريەكان، بازنە سەعاتىيەكان، چەند بازنەيەكن لەسەر خڕۆكى ئاسمان بە هەردوو پۆڵەكەيدا تێپەڕ دەبن بۆ دەستنيشان كردنى شوێنى ئەستێرەكان بەكار دێن. |

| | | |
|---|---|---|
| دوائر الطول | Longitude- circle | بازنەکانی درێژیی. |
| دواب، مواشي | Livestock | چوار پێیەکان، وڵاخ، ئاژەڵ. |
| دواة، دواية | Ink pot | دوێت، مەرکەبدان. |
| دواية | Pellicle | توێژاڵ، توێکلێکی تەنك. |
| دواجن | Domestic animal | گیانداری ماڵیی، وەکوو وڵاخ و ئاژەڵ و مریشك و . هتد. |
| دوار الهواء، هدا | Airsickness | سەرەگێژە کە لە فڕۆکەدا مرۆڤ تووشی دەبێت. |
| دوار الراس، دوخة، دوخان | Diddiness, vertigo | سەرگێژ خواردن، گێژبوون، سەرەخولێ، سەرەسووڕێ.. |
| دوار | Rotary, Rotor | خولاوە، سوڕاوە، زڤڕۆك. |
| دوار | Roter | تۆربین پەروانە. |
| دوار الشمس، عباد الشمس | Sunflower | گوڵەبەڕۆژە. |
| دوار البحر، دوخان | Sea Sickness | سەرەگێژەی دەریا، سەرە خولێی دەریا. |
| دوار الجبل | Nausea puna, Mountain- Sickness | سەرەگێژەی چیا، لە ئەنجامی سەرکەوتن بەسەر چیادا. |
| دوامة | Spinningtop | مزراح. |
| دوامة مائية، دوامة البحر | Whirl pool, Vortex | گێژاو، گێرەنگ، گەرداو، گێجاو. |
| دوامة ترابية، دوامة هوائية | Cyclone | گێژەلووکە، گەردەلوول باگێژە، گێژەبا، باگڕۆکە، باگڕۆك. |
| دوام (دينام) | Dynamo | دینەمۆ، ئامرازێکە بۆ گۆڕینی وزەی میکانیکیی بۆ وزەی کارەبایی یان بە پێچەوانەوە. |
| دوام | Perenniality, Continuation | خایاندن، بەردەوامی. |
| دواس، ملاعقي ابيض، ابو ملعقة | Spoonbill | دەنووك کەوچك، باڵندەیەکی ئاویی سپییە دەنووکەکەی لە کەوچك دەچێت. |
| دواس، نحام | Flamingo | سوورەقاز، سوورە قولنگ. |
| دواسة، مدوس | Treadle, pedal | پایدەر، ئامرازی کوتانەوە. |
| دوالي | Varices, Varix, Vericose-Veins | فراوانبوونی بۆڕیی خوێن هێنەری لەش. |
| دوالي الخصية، دوالي الصفن، دواليالالحبل المنوي | Varicocele | شۆڕبوونەوەی پێستی گون، کشان و پێچاو پێچ بوونی ئەو خوێن هێنەرەی کە خوێن لە گونەوە دەبات بۆ پێستی گون. |
| دواليك | Alternately | یەك لە دوای یەك، دوا بەدوا. |
| دواية | Dry saliva | لیکی وشکەوەبوو. |
| دوارة | | راجع ( دليل اتجاه الريح). |
| دوارات، دولابيات | Rotifera-Wheel-animal Cules | خولاوەکان، پێچکەییەکان، ڕەوڕەوەییەکان، کۆمەڵە گیاندارێکی ئاویی زۆر بچووکن بە میکرۆسکۆپ دەبینرێن. |
| دوبرادران، زمج، زماج شاه باز | Macagua | شاباز، باڵندەیەکی بچووکە لە کۆمەڵەی هەڵۆ مارو مێروو دەخوات. |
| دوباس، دوباس النخيل | Ommatissus-binotatus | مێرووی دارخورما، هاریی دارخورما، مێروویەکی زیان بەخشە بە دارخورما. |
| دوبل | Young ass | (١) یەکانە، نێرەبەراز، بەڵخە، بزەبەراز. (٢) جاشەکەر. |
| دوتزيا | Deutzia | (دۆتزیا) دەوەنێکی بچووکی قیتە گەڵاکانی دەوەرێت، گوڵێکی سپیی دەگرێت بەشێوەی هێشوو بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان دەروێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| دوجي | Sheepbur Cocklebur | جۆرە گیایەکە بە لەشەوە دەنووسێت، قەدەکەی دڕکاوییە. |
| دوحة | Largetree | درەختی گەورە. |
| دوخة | | راجع (دوار الراس). |
| دودة، نيلج | Soot - smut | رەشیی مەنجەڵ، دوورنج، دووژمنگ، گووژمنگ، قرم، هیس. |
| دودة | Worm vermis, Helminth | کرم، گیاندارێکی بێ بڕبڕەیە گەلێك جۆری هەیە زۆربان مشەخۆرن. |
| دودي | Wormy Vermiform | کرمی، شێوەکرم. |
| دودة بطيئة | Slow worm | کرمە سستە، جۆرە مارمێلکەیەکە بێ قاچە لە مار دەچێت پێڵووی چاوی هەیە. |
| دودة الكبد | Liverfluke, fasciola-hepatica | کرمی جگەر، پەپوولەی جگەر، کرمێکی مشەخۆرە لە جگەری مەڕو ماڵاتدا دەژێو تووشی نەخۆشیی دەکات لە گەڵای درەخت دەچێت. |
| دودة الأرض، دودة الطين، خرطون، شحمة الأرض | Earth worm Angle worm | کرمی زەویی، گڵ خۆرکە، کرمێکی ئەڵقە ئەڵقەی سووری باریکە لە ناو زەویدا دەژێ، زەوییەکە هەڵ دەگێڕێتەوە وە لەبەر ئەوە سوود بەخشە بۆ کشتوکاڵ. |
| دودة الخشب، سوسة الخشب | Wood worm | گراڵك، کرمی تەختە، مۆرانەی تەختە. |
| دودة مرض الفيل، دودو الفيلاريا | Filaria | کرمی فیلاریا، کرمێکی خڕی تەنکی بچووکە بە هۆی جۆرە مێشوولەیەکەوە بڵاو دەبێتەوە بۆ مرۆڤ. |
| دودة الدقيق | Meal worm Asopia farinalis | کرمی ئارد، مێروویەکە لەسەر ئارد دەژێ. |
| دودة الحبوب | Boll, worm | کرمی دانەوێڵە. |
| دودة الساق الثعبانية، ثعبانية الساق | Stemeel worm | کرمی ماریی قەد، مارۆکەی قەد، کرمێکی دەزوولەیییە لەسەر رووەك دەژێو زیانی پێ دەبەخشێت. |
| دودة الفية | Centipede | هەزار پێ، گیاندارێکی جومگەدارە لە کرم دەچێت. |
| دودة مسطحة، دودة مفلطحة | Flat worm, platyhelmi-nthes Trematodes | کرمی پان، کرمی پانکۆلە، کرمی پانکەڵە، وەکوو کرمی جگەر. |
| دودة حلقية | Ring worm Annelida | کرمی ئەڵقەیی، جۆرە کرمێکە لەشی لە چەند ئەلقەیەکی چوون یەك پێك هاتووە، وەکوو کرمی زەویی واتا گڵ خۆرکە. |
| دودة الشمع | Wax-worm | کرمی مێو، شانەی هەنگ، جۆرە مێروویەکە لەسەر مێوی ناو شانەی هەنگ دەژێ. |
| دودة الرئة | Lung worm | کرمی سیی، مەیتوولە، مارتوولە، کرمێکی کوشندەیە لە بۆریی سیی مەڕو ماڵاتو ئاژەڵدا دەژێ. |
| دودة بلوطية الخرطوم | ACORN WORM | لمۆزبەڕوو، کرمێکە لمۆزی لە بەڕو دەچێت. |
| دودة خيطية | THREAD WORM, Nematoda Ribbon worm | کرمی دەزوولەیی. |
| دودة رملية نرس | Nereis Sand worm | کرمی لم، جۆرە کرمێکی درێژە لەناو لمی قەراغی دەریاکاندا دەژێ. |
| دودة التراخينيا، ترخين، دودة الخنزير | Trichina | (تراخینیا)،جۆرە کرمێکە لە گۆشتی بەرازەوە بڵاو دەبێتەوە بۆ مرۆڤ. |
| دودة الأمعاء | Intestinal-worm Helminth | کرمی ریخۆڵە. |
| دودة السمك | Fishs worm | کرمی ماسی، جۆرە کرمێکە، لە ماسییەوە بڵاو دەبێتەوە بۆ مرۆڤ. |
| دودة كرباجية، دودة سوطية | Trichuris, whip worm | کرمی قیرپاچیی، کرمە قامچیی، کرمێکە نزیکەی دوو ئینج درێژە سەرێکی ئەستوورو سەرێکی باریکە لە ریخۆڵە باریکەدا دەژێ. |
| دودة البلاناريا | Planaria | کرمی ( پلاناریا )، کرمێکی بچوکە سەرەکەی پانو سێ گۆشەیە، مشەخۆر نیە. |

| | | |
|---|---|---|
| دودة غينيا | Guinea worm | كرمی غینیا: كرمێكه بەرە بەرە گەورە دەبێت هەتا درێژییەكەی دەگاتە یاردەیەك لەژێر پێستی مرۆڤدا دەژی. |
| دودة مروحية | Fan worm | كرمە باوەشێن. |
| دودة ثعبانية | Microscopic-worm Anguina-tritici Nematodes | كرمی ماریی، جۆرە كرمێكی بچووكی دەزوولەییە، نەخۆشیی رووەكی بڵاو دەكاتەوە. |
| دودة غما، دودة مقوسة | Gamma-noctua | كرمی كەوانەیی، مێرووییەكی سەوزە زیان بە رووەك دەبەخشێت. |
| دودة الكلونوركس | Clonorchiasis | (كرمی كلۆنۆركس) جۆرە كرمێكە لە ماسییەوە بڵاو دەبێتەوە بۆ مرۆڤ لە نیشانەكانی زەردوویی و سك چوون و ئازاری جگەرە. |
| دودة المقاعد،دودة الأجزيورس، دودة اوكسيورس، دودة دبوسية | Pin worm, Seat worm Oxyuriasis | كرمی دەرزیلەیی، كرمی كۆم، كرمی قنگ، كرمێكی بچووكی سپییە درێژییەكەی (١) سم دەبێت لە ریخۆڵە ئەستوورەو كۆمدا دەژی دەبێتە هۆی خورووییەكی زۆر لە كۆمدا. |
| دودة حلزونية، دودة انكلستوما | Hook-worm, Ancylostomiasis | |
| دودة شصية، دودة خطافية | Spiropterus | كرمی ئەنكستۆما، كرمی پێچاو پێچ، كرمی قولاپیی، ماری ناو سك، كرمێكی قولاب دارە لە ریخۆڵەدا دەژی بێچووەكانی لە پێستی قاچ و دەستەوە دەچنە ژوورەوەی لەش. |
| دودة شريطية، دودة وحيدة | Tape-worm Taenia Tenia | (تینیا)، كرمی شریتیی، كرمەتاكە، تاكە كرم، كرمە تاقانە، كرمی گوریسەجو، كرمێكە جاری وا هەیە درێژییەكەی دەگاتە ١٠ مەتر لەریخۆڵەی مرۆڤدا دەژی لە ئەنجامی خواردنی گۆشتی بەراز یان گاو مانگای نەكوڵاودا دەكەوێت. |
| دودة التربلاريا | Turbellaria | كرمی تەربیلاریا، كرمێكە لە گەڵای رووەك دەچێت. |
| دودة شريطية (في البقر) | | كرمی شریتیی مانگا، ئەو كرمە شریتەی كە بەشێك لە ژیانی لە لەشی مانگادا دەباتە سەر. |
| دودة شريطية (في الخنزير) | Tenia-solium | كرمی شریتیی بەراز، لەو كرمە شریتییەی كە بەشێك لە ژیانی لە لەشی بەرازدا دەباتە سەر. |
| دودة الاسكارس، ثعبان البطن | Ascariasis, Ascaris, Round worm | (ئەسكارس) ماری ناو سك، دڕنە، كرمی ئەسكارس، كرمی ناو سك كرمێكە درێژییەكەی (٦–١٤) ئینج دەبێت لە ریخۆڵەی مرۆڤدا دەژیت لە سەوزەو ئاوی پیسەوەدا دەكەوێت. |
| دودة الكلب، كيس الكلب، دودة الأكياس المائية، فقيعة | Echinococcus, Hydatidcyst Taenia-granulosa | كرمی سەگ، كرمێكە لە سەگەوە بڵاو دەبێتەوە بۆ مرۆڤ لە لەشی مرۆڤدا توورەكە پەیدا دەكات هەندێك جار قەبارەی توورەكەكە دەگاتە قەبارەی پرتەقاڵێك و دەتەقێت و هەندێك جار دەبێتە هۆی مردنی كتوپڕ. |
| دودة المدينة، فيلاريا المدينة | Dracunculus Medina-worm | كرمێكە لە هەندێك گیانداری توێكڵدارەوە(وەكوو كێچی ئاویی)دا دەكەوێت بۆ مرۆڤ بەهۆی خواردن و ئاوی پیسەوە لەژێر پێستدا دەژی خڕو ساف و تەنك و سپییە، سەرەكەی لە ژێرەوە پێست كون دەكات و دەبێتە هۆی خوورو و رشانەوەو سك چوون و هەناسەی تەنگی. |
| دودة مستديرة | Round worm | كرمی لوولەیی:– وەكوو كرمی زەویی و كرمی ئەسكارس. |
| دودة القرمز | Cochineal-insect | كرمی قرمز:– جۆرە مێروویەكە لەسەر داری بەڕوو دەژیی، مێیەكانی وشك دەكرێتەوە رەنگێكی سوور یان لێ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی رەنگ كردن بەكار دێت. |
| دودة حمراء | Gape worm | كرمە سوورە، كرمێكی دەزوولەییە دەبێتە هۆی نەخۆشی مریشك. |

| | | |
|---|---|---|
| دودة القز، دودة الحرير | Silk worm | کرمی ئاوریشم، جۆرە مێرووییەکە لەسەر داری توو دەژی ئاوریشمی سرووشتی درووست دەکات. |
| دودة الجبن | Cheese- maggot, Skipper | کرمی پەنیر. |
| دودة جوفية | Aschelminthes | کرمی ناوبۆش، کرمی توورەکەیی. |
| دودة القطن | Cotton-worm | کرمی لۆکە، مێروویەکی سەوزە زیان بە رووەکی لۆکە دەبەخشێت لۆکە دەبەخشێت. |
| دودة قارضة | Canker worm | کرمی قرتێنەر، بریتییە لە میتۆلکەی هەندێك مێروو کە ئەندامی رووەك دەقرتێنێت. |
| دودة البلهارزيا | Schistosoma Haematobium Bilharzia-worm | کرمی بەلهارزیا، کرمی میزی خوێناویی. |
| دودة مثانية | Bladder-worm | کرمی میزەڵدانی، یەکێکە لە هەنگاوەکانی گەورەبوونی کرمی شریتیی. |
| دودة المعدة، دودة البطن | Stomach worm | کرمی گەدە، سنگ، مارتوولە. |
| دودة الوهج، دودة مضيئة، ذبابة النار، يراعة، حباحب | Fire Fly, Glow worm | گوڵە ئەستێرە، جۆرە مێرووییەکە (قالۆنچەیەکە) بەشەو لەشی رووناکیی دەداتەوە. |
| دودو | Dodo | (دۆدۆ)، باڵندەیەکی قرتی کەوتووە لە قاز چووە لە قەلەمونێك گەورەتر بووە. |
| دوديسين | Dodecene | (دۆدیسین)، مادەیەکی ئاوەندییە لە دروست کردنی دەرمان‌و رەنگ‌و بۆنی خۆشدابەکاردێت. |
| دودونيا | Dodonea | (دۆدۆنیا)، دەوەنێکی هەمیشە سەوزە دیمەنێکی جوانی هەیە بۆ پەرژین بەکاردێت‌و دارەکەی گۆچان‌و دەسکی کەلەپەلی لێ دروست دەکرێت. |
| دود الأسنان | Dentium-Cavernae | ددان کلۆربوون، ددان رەش بوون. |
| دور،دورة | Cycle period | سووڕ، نۆرە، خول، پێچ، وەرچەرخان، سرە، کایە، سەردەم. |
| دورة | Revcolution | (١)لە زانستی ئەستێرەوانیدا، جووڵانەوەی، جمان، جووڵانەوەی تەنێکی ئاسمانی دەی خاێنێت بۆ ئەوەی کە خولەکەی تەواو بکات.<br>(٢)لە زانستی زەوی (جیۆلۆجی) دا ئەو کاتە (وەختەیە) کە تیایدا گۆڕانێك لە سەر رووی زەوی پەیدا دەبێت وەکوو پەیدابوونی چیاو شێو. |
| دور | Period | ١- لە زانستی زەویی (جیۆلۆجی) دا : بەشێکە لە وەختی جیۆلۆجی کە بەسەر زەویدا تێپەڕ بوەو هەندێك بوو بەردی(متحجرات) گیانداروو رووەکی تیادا پەیدا بووە لەناو زەویدا.<br>٢- لە زانستی ئەستێرەوانیدا: ئەو ماوەیە(وەختەیە) کە ئەستێرەیەك یان تەنێکی ئاسمانیی دەی خایەنێت لەکاتی سووڕانەوەی یەکجاریە دەوری تەنێکی ئاسمانییدا. |
| دوران | Rotation,circulation | سووڕانەوە، خولانەوە. |
| | Revolution | ١- لە زانستی ئەستێرەوانیدا: جووڵانەوە، جمان، جوڵانەوەی تەنێکی ئاسمانی لە خولگەکەیدا یان ئەو وەختەی کە تەنێکی ئاسمانی دەیخایەنێت بۆ ئەوەی کە خولەکەی تەواو بکات.<br>٢- لە زانستی زەوی (جیۆلۆجی) دا ، ئەو کاتە (وەختە) یە کە تیایدا گۆڕانێك لەسەر رووی زەویی پەیدا دەبێت وەکوو پەیدابوونی چیاو شێو. |

| | | |
|---|---|---|
| دورة | Cycle | ١- لە زانستی فیزیادا: خول، سوور، یەکە یەکە بۆ خەملاندنی هاتوچۆکردنی (تردد) شەپۆلی دەنگو رادیۆ.<br>٢- لە زانستی زیندەوەردا، خول ، سوور، زنجیرەیەکە لە شێوازیو گۆران پەیدابوون لە مێژوویژیانی گیاندارو روەکدا.<br>٣- خول. سوور، زنجیرە دیاردەیەك کە هەمیشە بە هەمان ڕێکوپێکیر روودەدەن‌و بە ڕێکو پێکی دووبارە دەبەوە. |
| دور الأوليجوسين | Oligocene period | سەردەمی ئۆلیجۆسین، دەوری سێهەم لە سەردەمی ژیانی ناوەراست کە بەسەر زەویدا تێپەر بوەو مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ ٣٥-٤٥ ملیۆن سال لەمەوبەر. |
| دور البلوغ | Maturity period | قراسەبوون، بالق بوون، رەسیدەبوون. |
| دور السبات | Dormancy | سووری مت بوون، سووری سربوون، خولی مت بوون، خولی سربوون. |
| دور الحضانة | Incubation-period | سووری، کرکەوتن ئەو سوورە یانئەو خولەیە کە میکرۆب تیایدا نەش‌و نماو زاوزێ دەکات لە لەشی گیانەوەردا. |
| دور الأستحالة | Metamorphosis | سووری، گەورەبون وەکوو لە مێرووودا. |
| دور النقاهة | Convalescence Recovery | خووزتێکەران، تازە چاك بوونەوە لە نەخۆشی بوژانەوە. |
| دور الكهولة | Maturity of age, Mature age | ماوەی کامڵی، دەوری کامل بوون. |
| دورة جيولوجية | Geological period | ماوەی جیۆلۆجی، سەردەمی جیۆلۆجی. |
| دورة المياه، مرحاض مطهرة | Lavatory, water-closet, latrine | ئابخانە، ئاودەستخانە. |
| دورة الشبق، دورة نزوية | Estrvation | جووت بەندان، بەتەڵەیی، بە کەڵیی. |
| دورة تناسلية | Genital-Cycle, Genesial-Cycle | سووری زاوزێ. |
| دورة الحياة | Life-Cycle | سووری ژیان، خولی ژیان، ئەو زنجیرە گۆرانانەی کە لە شێوەو فەرمانی گیاندارو روەکدا روو دەدەن لە نەوەیەکی (جیل) تەواودا. |
| دورة الكاربون | Carbon cycle | سووری کاربۆن، ئەو گۆرانانەی کە لە سروشتدا بەسەر توخمی کاربۆندا دێن. |
| دورة اقترانية | Syrodic period | ئەو کاتەی کە ئەستێرەیەك دەیخایەنێت بۆ ئەوەی سورێکی تەواو بە دەوری خۆردا بخوات بە نیسبەت زەوییەوە. |
| دورة الماء | Water-Cycle | سووری ئاو: ئەو گۆرانەی کە بەسەر ئاودا دێت لە سروشتدا. |
| دورة نجمية | Sidereal period | سووری ئەستێرەیی، خولی ئەستێرەیی، ئەو کاتەی ( ماوەیەی) کە ئەستێرەیەك دەی دەیخایەنێت لە خولێکدا. |
| دورة دموية | Biood circulation Circulatory-System | سووری خوێن، سوورانەوەی خوێن. |
| دورة النتروجين | Nitrogen-Cycle | سووری نایترۆجین، ئو گۆرانانەی کە بەسەر توخمی نایترۆجیندا دێت لە سروشتدا. |
| دورة زراعية | Rotation of crops | سووری کشتوکاڵیی دابەشکردنی زەویی بە چەند بەشێکەوە بۆ ئەوەی کە بە نۆرە کشتوکاڵی‌یان تیادا بکرێت. |
| دورنتا، ندى الذهب | Sky-flower, Golden dewdrop, Duranta | گوڵی ئاسمان، ئاورنگی زێر، دەوەنێکی هەمیشە سەوزە گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی شین شۆر دەبێتەوە بەشێوەی هێشوو بە رەنگێکی زێرییە، بۆ رازاندنەوەو پەرژین دەروێنرێت. |
| دوري | Cyclic, periodical, periodic, rotatory | خولیی، سوریی، بە نۆرە. |
| دوري | Passer, sparrow | پاساریی، چۆلەکە پاساری، چیپت. |

| | | |
|---|---|---|
| دورين | Duren, Trypano Somiasis | نەخۆشیی، (تریپانۆسۆم)(دوورین)، نەخۆشییەکە تووشی ولاخ دەبێت بەهۆی کرمێکی باریکەوە. |
| دورم، اشق | Dorema | (دۆریما)، گیایەکی دەشتەکیی پزیشکییە، زەمقی ئامونیاکی لێ دەردەهێنرێت. |
| دوركنج | Dorking | (دۆرکینگ)، جۆرە مریشکێکە هێلکە زۆر دەکات. |
| دورق | Decanter Carafe, Matrass, Flask | کەمۆڵە، گومگومە، سوارحیی. |
| دورق غسيل | Washing bottle | کەموڵەی شتن. |
| دورق تقطير | Distilling flask | کەمۆڵەی دڵۆپاندن. |
| دورق ارلنماير، دورقمخروطي | Erlen neyer-flask Conical flask | کەمۆڵەی ئەرلنمایەر کەمۆڵەی قووچەکیی، جۆرە قاپێکی قووچەکییە لە تاقیکردنەوەی کیمیاییدا بەکاردێت. |
| دورق غليان | Boiling flask | کەمۆڵەی کوڵاندن. |
| دوزينة، درزن | Dozen | دەرزەن، دەستە،دوازدە پارچە. |
| دوس، وطء | Treading | پێ پیانان، پێ شێل. |
| دوسيية، ملفة، اضبارة | File, dossier | فایل، دۆسیە. |
| دوسينيةشل، سفرجل هندي | Docycnia | بەهێی هیندیی، دەوەنێکە لە هیندستان دەروێت گەڵاکەی لە گەڵای گوێژ دەچێت بەرەکەی خڕو بچووکەو خۆشە دەخورێت. |
| دوسرج، شعير ابليس | Oat-grass | گیایەکی زیان بەخشە لە گەنم دەچێت. |
| دوسر،شوفان، خرطال رفيع، جاودار، هرطمان | Wildoat, False Oat, Darnel | هەرزنە کێویلە، کاڵتاس، مرۆر، گیا بریشی، چەودەر، دووسەر، زیزانە، زیوان، دنێب. |
| دوسنطاريا | | راجع (دسنطاريا). |
| دش، نضح | Douche | دووش، بۆ خۆشتن. |
| دش مهبلي | Vaginal Doushe | دووشی گوڵینك، شتن گولینکی ئافرەت. بە دەرمان. |
| دوع احمر، سمك احمر | Red-Fish | ماسییە سوورە، سوورە ماسیی. |
| دوفان، جاثوم، كابوس | Nightmare | شەوە، مۆتەکە، مێردەزمە، دێوەزمە، خێو. |
| دو فصة، بصلة | Buld | سەلك، قەدی ژێر زەویی کە خڕبێت و خواردەمەنیی تیادا کۆکرابێتەوە. وەکوو لە پیازو سیردا. |
| دوق | Duke | دووق، میر. |
| دوك | Douc | (دۆوك)، جۆرە مەیمونێکە لە هیندستان بە گیاندارێکی پیرۆزی دادەنێن. |
| دولاب، خزانة | Cupboard | دۆڵاب، بۆفیە. |
| دولاب، عجلة | Wheel | چەرخ، رەوڕەوە، پێچکە. |
| دولابيات، دولرات | Rotifer | گیاندارە خولاوەکان. |
| دولاب الماء، ناعرة، ناعورة | Water wheel, Noria | چەرخی ئاو، چەرخاو، پەڕەکەی ئاو، چەرتی ئاو، جەنجەڕی ئاو. |
| دولاب وجزع، ملفاف | Wheel and axle | پێکەو تەوەرە. |
| دولاب صقل | Grinder | مەکینەی چەقۆ تیژکردن. |
| دولاب الغزل | Spindle wheel | خەرەك. |
| دولاب الملابس | Wardrobe | کەنتۆر، دۆڵابی جلو بەرگ. |
| دولار، ريال امريكي | Dollar | (دۆلار) ریاڵی ئەمەریکیی، دراوی وولاتەیەککرتووەکانی ئەمریکا. |

| | | |
|---|---|---|
| دولاب الرمل، قنفذ البحر | Sanddollar | ژیشکی دەریا، گیاندارێکی خڕو قوپاوە حەز بەناو لم دەکات. |
| دولعة، دلاعة | Water-melon | شووتیی، شفتیی. |
| دولج | Lair, Form | پشقڵ یان تەرسی ئاژەڵ. |
| دولة ، حکومة | State, covernment | دەوڵەت، حکومەت: ئەو کۆمەڵە لێپرسراوەی کە وڵات دەبات بەڕێوە. |
| دولة، اخطبوط | Common Devilfish, Common Octopus | ماری هەست سەر، هەشت پێ، ئەختەبووت، گیاندارێکی ئاوییی قاچ سەری لینجی نەرمە هەشت پەل وا بە سەرییەوە هەر یەکیان دەمێکی مژۆکی پێوەیە. گیاندارە لاوازە دەریاییەکانی تر دەخوات. |
| دولفین، دخس، تخس | Dolphin | (١) دۆلفین، جۆرە نەهەنگێکە نزیکەی (٢) مەتر دەبێت، خێرا مەلە دەکات، دەتوانێت باز بدات زوو ماڵی دەکرێت.<br>(٢) دۆلفین جۆرە ماسییەکە لە نەهەنگی دۆلفین دەچێت. |
| دولومایت | Dolomite | (دۆلۆمایت)، تێکەڵاوی کالسیۆم کاربۆنەیتو مەنگەنیز کاربۆنەیت، بەشێوەی کریستاڵێکی سروشتیی، لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی قاوغی گیاندارە دەریاییەکان پەیدا دەبێت. |
| دولریت | Dolerite | (دۆلریت)، جۆرێکە لە بەردی بورکانیی. |
| دوم، سدر، نبق | African-lotus, Nubk tree | داری تاوك، درەختێکیی گەورەیە بەرەکەی لە گوێژ دەچێت خڕو سەوزو شیرینو مەیلەو تفتە. |
| دوم، شجر المقل | Ginger-bread, Doum-palm | (دارخورمای دۆوم) درەختێکە لە کۆمەڵەی دارخورما قەدەکەی لقدارە، تەختەکەی بەنرخە، گەڵاکەی پەتو حەسیری لێ دروست دەکرێت، جۆرە دۆشاوێك لە بەرەکەی دروست دەکرێت. |
| دوم تدمر، تال | Tal palm | (دارخورمای تال)، درەختێکە لە کۆمەڵەی دارخورما ، قەدەکەی قیتو باریکە ، گەڵاکەی لە باوەشێن دەچێت ئاوێکی شیرین لە قەدەکەی دروست دەکرێت، تەختەکەی رەقو رەشە کەلو پەلی لێ دروست دەکرێت. |
| دومة | Testicle | گوونی شۆڕ وەکوو لە گاو بەراندا. |
| دومان المرکب دومس | Helm Furia | سوکانی کەشتی، ستێرنی کەشتی(فیوریا)، جۆرێکە لە شەمشەمەکوێرە. |
| دومینو | Dominoes | دۆمینە، جۆرە یارییەکە. |
| دوندرمة | | (راجع دندرمە). |
| دون صوتي | Infra Sonic | ژێر دەنگ، ئەو شەپۆلی دەنگەی کە بە گوێی مرۆڤ نابسترێت بەڵام دەشێت کە لەسەر شریت تۆمار بکرێت بە جۆرێکی ئەوتۆ کە ببیسترێت. |
| دون الأحمر | Infra red | ژێر سوور، تیشکی ژێر سوورکە لە شەبەنگی خۆردا دەردەکەوێت. |
| دوي | Reverberation | زرمە، شریخە ، ناڵە، کرمە. |
| دویرة | Drumlin | گردێك شێوەیەکی هێلکەیی هەبێت کە بە کاری بەفر دروست بووبێت. |
| دهاء | Sagacity | بیمەتیی، زۆرزانیی. |
| دهامین، جزاب | Erodion | دەرزیلۆکە: جۆرەگیایەکە. |
| دهانج، قرعوس، فلج، قرعوش، قرمل | Bactrian-Camel | وشتری دوو دووگ. |
| دهان، دلوك، مروخ | Liniment, unguent | چەوریی یان مەڵحەم بۆ چەورکردنو شێلانی لەش. |
| دهان | Blubber | چەوریی، چینێکی چەوریی ئەستوورە لەژێر پێستی شیردەرە دەریاییەکاندا بۆ پاراستنی گەرمی لەشیان وەکوو لە نەهەنگو بووکی دەریادا. |

| | | |
|---|---|---|
| دهان | Painter | بۆیەچیی. |
| دهان، طلاء | Paint | بۆیە، بۆیاخ. |
| دهبل | Casarca | (کاسارکا)، جۆرە مراوییەکە رەنگی هەمە جۆری هەیە. |
| دهداء | Young of camel | بەچکەی وشتر. |
| دهر | Age, Era, Epoch | سەدە، رۆژگار، چاخ، چەرخ، سەردەم کاتێکی زۆر دوور درێژ، هەروەها یەکێکە لە پێنج بەشە سەرەکیەکەی سەردەمی جیۆلۆجیی. |
| دهس، دعس | Tread upon | پێشێل، پلیشاندنەوە. |
| دهشة | Amazement | واق ورمان، سەرسورمان. |
| دهق، الة تعذیب | Stocks | پاچڵە، ئامرازێکە بۆ ئازاردانی مرۆڤ. |
| دهق، سوسن ابیض | Florentine-iris, Orris-root | سوێسنەی سپیی، جۆرە گیایەکەگوڵی جوان دەگرێت. |
| دهلیز | Corridor | دالان، رارەو، رێڕەوێکی باریک و درێژ لەناو ماڵ و خانوودا. |
| دهلیز (دهلیز الأذن) | Vestibule Aditus, Vestibulum | رارەوی ناوەوەی گوێچکە. |
| دهلیة، اضالیا | Georgina, Dahlia | (دالیا) روەکێکی سەلك دارە، گوڵی گەورەو هەمەرەنگە دەگرێت. |
| دهماء | | گیایەکە گوڵەکەی سوورە بۆ دەباخ کردن بەکاردێت. |
| دهمة، سواد | Blackness, Darkness | تاریکیی، رەشیی. |
| دهن، زیت، شحم | Fat-Oil | چەوریی، تەواش، مادەیەکی نیمچە رەقی یان شلی سپیی مەیلەو زەردە لە لەشی گیانداروو روەك دەردەهێنرێت لە خواردەمەنی و دروستکردنی سابون و بۆیەدا بەکاردێت. |
| دهنان | Purple-panic-grass | گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵودان. |
| دهناء | | راجع (دهماء). |
| دهن القداح | Neroli | رۆنی گوڵی نارنج، رۆنێکی بۆنخۆشە لە گوڵی نارنج دەردەهێنرێت. |
| دهن الشعر | Brilliantine | (بریل کرێم) رۆنی سەر، رۆنی قژ. |
| دهن الکتان | Linseed oil | رۆنی کەتان. |
| دهن رأس الحوت | Spermaceti | رۆنی سەری نەهەنگ، مادەیەکی چەوری سپییە لەسەری نەهەنگی عەنبەر دەردەهێنرێت. |
| دهن المکائن، کریز | Grease | گریس، رۆنی مەکینە. |
| دهن السمك، زیت کبد الحوت | Cod-liver-Oil | رۆن ماسیی. |
| دهن النارجیل | Cocose | رۆنی گوێزی هیند. |
| دهن النخیل | Palm Oil | رۆنی دارخورما. |
| دهنیات، دهونات، شحوم | Lipids | رۆنەکان، چەورییەکان. |
| دهني ، دهین | Adipose, Aliphatic Fatty | رۆنی، چەور. |
| دهنج مالاخیت | Malachite | (مالاخیت)، (مالاکیت)، بریتییە لە مادەی کوپەریك کاربۆنەیت(کاربۆناتی مس)ی سروشتیی. |
| دهول | Dhole | (دهۆل): جۆرە سەگێکی کێوییە بۆ راوکردن بەکاردێت. |
| دهون مهدرجة دهون مبیسة | Hardened-fats | رۆنی وشککراوە، رۆنی هایدرێن کراو:- رۆنێکی روەکی شلی بۆن و تام ناخۆش وەکو رۆنی کونجی گەرم دەکرێت و گازی هایدرۆجینی پیادا تێپەر دەکرێت بۆ ئەوەی کە بۆ خواردن دەست بدات. |

| | | |
|---|---|---|
| ديابوليت | Diaboleite | (دیابۆلیت)، بەردێکی بەنرخە ڕەنگەکەی شینی تۆخە. |
| دياباز | Diabase | (دیابێز) بەردێکی ئاگرینی گرنج گرنجە. |
| دياتوميت | Diatomite | (دیاتۆمیت) بەردێکی سووکی کون کونی فشەڵە لە ئەنجامی تۆپەڵ بوونی لەشی قەوزە پێک دێت. |
| دياسبور | Diaspore | (دیاسپۆر)، هایدرۆکسیدی ئەلەمنیۆمی ئاویی. |
| دياتوم | Diatom | (دیاتۆم)، جۆرە قەوزەیەکی یەک خانەییە، قاوغەکەی کانزای سلیکۆن و مەنگەنیزی تیادایە ڕەنگەکەی سەوز یان قاوەیی یان ئاڵتونییە. |
| دياستاز | Diastase | (دایەستێز): جۆرە ئەنزیمێکە نیشاستە دەگۆڕێت بۆ شەکرێکی ساکار. |
| دیامغنیطیة، دیا مغناطیسیة | Diamagnetism | (دیامۆگناتیسی): سیفەتێکە لە مادەیەکدا وای لێدەکات کە کەمێك دوور بکەوێتەوە لە کایەی موگناتیسی وەکوو لە توخمی بیزموسدا. |
| دياثيرمي | Diathermy | (دیاسێرمی): چارەسەرکردن بە تێپەڕکردنی گەرمیی، پەیداکردنی گەرمی(بەهۆی تەوژمی کارەباوە) لە لەشی مرۆڤدا بۆ مەبەستی پزیشکی و چارەکردن. |
| دياجين | Diagenesis | (دیاجین): ئەو گۆڕانەی کە بەسەر بەرددا هاتووە بەر لە ڕەق بوونەوەی. |
| دياسة | Threshing | گێرە، گێرەکردنی دەغڵودان. |
| ديباج | Pure Silk Clothes | ئەتڵەس، سەوز، ئاوریشمی ڕوت. |
| ديباجة، مقدمة | Preface, Introduction | سەرەتا، پێشەکی. |
| ديباج (العشار) | Mudar plant | دەرکەنار، دارو دەوەنێکە بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان دەروێنرێت. |
| ديبلودوكس | Diplodocus | (دیپلۆدۆکەس)، دینۆسۆری گیا خۆر، گیاندارێکی کەتەی قڕتێکەوتووە. |
| ديترانوبيا | Deuteranopia | (دیوتیرانۆپیا) جۆرێکە لە نەخۆشیی ڕەنگ کوێریی، نەخۆشەکە ڕەنگی سوورو سەوز لە یەکتری جیا ناکاتەوە. |
| ديجور | Gloom | تاریکی، نووتەکی، شەوەزەنگ. |
| ديجيتال، كف الثعلب، قفاز الثعلب، اصبع العذراء، زهرة الكشتبان | Finger flower, Foxglove, Digitalis | گوڵە ئەنگوستیلە، پەنجەی خانم، گیایەکەگوڵەکەی لە پەنجە دەچێت،دەرمانی چارەکردنی ئاژەڵی لێ دەردەهێنرێت. |
| ديجيتالين | Digitalin | (دیجیتالین)، ئاوێتەیەکە لە گەڵای ڕووەکی گوڵە ئەنگوستیلە (دیجیتال) دەردەهێنرێت، بەشێوەی دەرمانی وریاکەرەوە بەکار دەهێنرێت. |
| دیداب | Wild- ass. Onager | کەرەکێویی. |
| دیدبان، دیدب | Sentry | پاسەوان، یاساوڵ. |
| دي . دي . تي | | راجع (د . د . ت). |
| ديرموبترات | Dermatoptera | (دێرمۆپتیرا) باڵ پێستییەکان:- کۆمەڵە گیاندارێکی شیردەرن دەموچاویان لە هێنی سەگ دەچێت پەردەیەك وا بە قۆڵیانەوەیێی دەفڕن. |
| ديرم، دارم | Walnut-shell | زەرك، توێکڵە سەوزەکەی دارو بەری گوێز بۆ ڕەنگ کردنی لێوی ئافرەت بە سوورو زەرد بەکاردێت. |
| ديزلتري | | راجع (دەسنطاریا). |
| ديس | Vine-tie, Diss | زەل، گیایەکی دەشتەکییە لە زەلکاو، زۆنگاودا دەڕوێت. |
| ديس الحصر، حلال الحصر | LaKe club-brush, poolrush | زەلی حەسیر، جۆرە زەلێکە حەسیری لێ دروست دەکرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| دیسیغرام | Decigram | دێیسیگرام -١٠/١ ی گرامێك. |
| دیسیمتر | Decimeter | دیسیمەتر- ١٠/١ی مەترێك. |
| دي ، سي، تيار مباشر، تيار مستمر | Direct-current, D . C | تەوژمی بەردەوام، تەوژمی کارەبایی بەردەوام، تەوژمی کارەبایی راستەوخۆ، تەوژمی کارەبایی نەگۆڕ. |
| ديسم، جرو الدب | Bears cub | بەچکە ورچ. |
| ديسم، خشرم، قفير | Swarm | پۆرەی هەنگ، کوورەی هەنگ. |
| ديسم، شدخ، قطيفة | Blite, wild amaranth | گوڵە قەیفە، سلقی ئەمریکیی، گیایەکە گەڵاکەی گەورەیە دەکرێت بە چێشت گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی ئەرخەوانیی‌یە لە باوەشێن دەچێت. |
| ديسكلوزيت | Descloizite | (دیسکلۆزیت): بەردێکی کانزاییە قورقوشم و زینك و ولفرام و فانادیۆمی تیادایە رەنگێکی قاوەیی مەیلەو سوور یان قاوەیی مەیلەو رەشی هەیە. |
| ديسقوريا، انيام، بطاطة صينية | Yam, Dioscorea | پەتاتەی چینی، رووەکێکی سەلکدارە سەلکەکەی کەمێك تاڵە بە کوڵاندن شیرین دەبێت و دەخورێت. |
| ديسبروسيوم | | راجع( دايسبروسيوم). |
| ديش، فاغرة امريكية | Prickiyash | دارەڕەشیی دڕکاوی، رووەکێکە گوڵی زەرد دەگرێت، تەختەکەی بە نرخە. |
| ديشار، خنشار كبير | Brack fern, Bracken, Eagle fern | رووەکێکە لە کۆمەڵەی کلکە ئەسپ (سرخس) گەڵاکەی ناوێتەیە نزیکەی دوو مەتر درێژ دەبێت. |
| ديفوني | Devonian | (دیڤۆنی): کۆنترین خوڵ سوور لەسەر دەمی ژیانی دێرین و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٣٠٠) ملیۆن ساڵ لەمەوبەر. |
| ديك، ابو يقظان | Cock, Rooster | کەڵەشێر، کەڵەباب. |
| ديك افرق، ديك هندي، ديك رومي | Turkey Cock | کەڵەشێری هەزار پۆپنە، قلەموون، بۆ، عەلی شیش، قەل ، عەلو عەلو. |
| ديك الخلنج | Grouse | قەتێ، سوورەباڵە، تەیهو بیهو، جۆرە باڵندەیەکە لە سوێسکە دەچێت. |
| ديك الرياح، دليل اتجاه الريح، دوارة | | راجع ( دليل اتجاه الريح). |
| ديك بري، ديك جبلي، ديك صحراوي، تدرج، تذور | Pheasant | قرقاو،چوڕپوڕ، تورمنگ، کەڵەشێری کێویی، کەڵەشێری بیابان، باڵندەیەکی زۆر جوانی کلك درێژە، لە کەڵەشێرو تاوس دەچێت. |
| ديك اراجس البري | Argus- pheasant | کەڵەشێرە، کێویی ئەرجەس، قرقاوڵی ئەرجەس: باڵندەیەکی درێژە پەڕی باڵەکەی پەڵەی ئەوتۆی پێوەیە لەشێوەی چاو دەچێت لەناو دارستاندا دەژی. |
| ديك البحر | Scarus-gallus | کەڵەشێری دەریا، جۆرە ماسییەکی دەریاییە. |
| ديك الصخور | Cock of the rocks, Gulanan | کەڵەشێری بەردەڵانیی. |
| ديك البحر، قيون، قاوند | King fisher, Halcyon | (هالسیۆن)، کەڵەشێری دەریا، باڵندەیەکی دەنووك پانە لە قەراغ ئاوو دارستاندا دەژی. |
| ديك الغابة، دجاجة الأرض | Wood-cock jungle Fowl | کەڵەشێری دارستان، مریشکی زەویی، باڵندەیەکی گۆشت خۆری قاوەیی مەیلەو رەشی چاو گەورەی دەنووك درێژە لە دارستانەکانی ناوچە گەرمەکانی ئاسیادا دەژی. |
| ديكاغرام | Dece gram | دەگرام - ١٠ گرام. |
| ديكالتر | Decalitre | دە لیتر - ١٠ لیتر. |
| ديكامتر | Decametre | دەمەتر- ١٠ مەتر. |
| ديكان | Decane | (دێکان)، ئاوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنی‌یە لە (١٠) ئەتۆم کاربۆن و (٢٢) ئەتۆم هایدرۆجین پێکهاتووە. |

| | | |
|---|---|---|
| دیكران، حزاز | Forkmoss- Dicranum | کەڤز، قەوزەی گوێسەبانە، رومکی قاش قاش. |
| دیكستروز، كلولوز، سكر العنب | Glucose Dextrose | (گلوکۆز)، (دێکسترۆز)، شەکری ترێ، شەکرێکی ساکارە لە ترێو خورمادا هەیە هەروەها لە نیشاستەش دروست دەکرێت بەشێوەی خۆراك بۆ منداڵی ساواو نەخۆش بەکاردێت. |
| دیكسترین | Dextrin | (دیکسترین): مادەیەکی کاربۆهیدراتی سپی یان زەردە بە گەرم کردنی نیشاستە بە شێنەیی پەیدا دەبێت وەکوو زەمق بەکار دەهێنرێت. |
| دیكوتیل، مجلاح | Peccary | (پێکاری)، گیاندارێکە لە کۆمەڵەی بەراز. |
| دیكور، زخرفة | Decoration | (دیکۆر)، نەخشاندن، رازاندنەوە. |
| دیكون | DaiKon | (دایکون) تۆری جاپانیی. |
| دیلیزة، دیلزة | DialYsis | (دیالایسیس)، جیاکردنەوەی مولیکیولە (گەردە) بچووکەکان لەگیراوەیەکدا، بەهۆی پەردەیەکی نیمچە دەڵێنەر کە ماوە دەدات تەنها بە مۆلیکیولە بچووکەکان بۆ تێپەڕبوون. |
| دیلم، قطاط الرمل | Sandgrouse | قەتێی لم، پۆڕ، کەناچە، زیوەکەو، زڕەکەو. |
| دیلم، خلیة النمل | Ant- hill | شارە مێرووله. |
| دیمقراطیة | Democracy | دیمۆکراسیی، دیمۆکراتیەت. |
| دیم | Dryland | دێم، دێمەکار، دێمەڕۆیی زەوییەکە هەر بە باران ئاو دەخواتەوە. |
| دیمومة، دوام | Duration, Continuation | بەردەوام بوون. |
| دیمر | Dimer | (دایمێر)، دوومولیکیول یەکیان گرتبێت بۆ پەیدا کردنی مولیکیولێکی گەورە وەکوو جووت سەکەراید کە لە دوو مولیکول گلو کۆز پێکهاتووە. |
| دیموغرافي | Demographer | (دیمۆگرافەر) زانا لە زانستی هەڵ ژمێریدا. |
| ذیموغرافیا | Demography | (دیمۆگرافی)، زانستی هەڵژمێری، خوێندنی دانیشتوانی وڵاتێك دەربارەی لە دایك بوونو مردنو تەندروستی و ژنهێنان هتد. |
| دیماسي | Under ground | ژێر زەویی، وەکوو قەدی رووەك کە لەژێر زەویدا بێت. |
| دین، قرض | Debt, Detbit | قەرز، وام، وانك. |
| دینجو، دنكو، ذئب، استرالیا، دنغ | Dingo | (دینگۆ)، گورگی ئوسترالیا، جۆرە گورگێکی زۆر دڕندەیە لە سەگ دەچێت لەڕۆزی پانە، گوێچکەکەی کورتو تیسکنە رەنگەکەی قاوەییو مەیلەو سوورە لە ئوسترالیا دەژی. |
| دینامیت | Dynamite, Dinamite | (دەنەمێت) تەقەمەنی‌یەکە لەمادەی نیترۆ گلیسیرینو خۆڵی دیاتۆمی دروست دەکرێت ، بۆ شکاندنی بەردی گەورەو کردنەوەی ڕێگاو بان بەکار دێت. |
| دینامیکا، دینامیة | Dynamics | (دینامیك): لقێکە لەزانستی فیزیا ئەو هێزانە دەخوێنێت کە دەبنە هۆی جوڵانەوە. |
| دینامیکا هوائیة | Aerodynamics | (دینامیکی هەوایی)، ئەو زانستی‌یەی کە باسی جوڵانەوەو سیفەتە فیزیاییەکانی هەواو گازەکانی تر دەکات. |
| دینامیکا السوائل | Hydrodynamics | (هایدرۆدینامیك) دینامیکی شلەکان: زانستی خوێندنی سیفەتی شلەکان وەکوو دیمەنو خەستی هتد. |
| دینامیکا حراریة | Thermo dynamics | (دینامیکی گەرمیی): لقێکە لە زانستی فیزیا باسی پەیوەندیی نێوان گەرمییو وزەی میکانیکیی دەکات. |
| دینامیکاکهربائیة | Electro dynamics | (ئەلیکترۆ دینامیك) دینامیکی کارەباییی:- لقێکە لە زانستی فیزیا باسی ئەنجامی کارلێکی تەوژمە کارەبایەکان لەگەڵ موگناتیسیی یان لە نێوانی خۆیاندا دەکات. |

| | | |
|---|---|---|
| ديناموكراف، ديناموغراف | Dynamograph | (ديناموگراف) ئامرازێكە هێزی ماسولكەكان پیشان دەدات بە وێنە. |
| دينامتر | Dynameter | (دینامیتــەر): ئامرازێكــە بــۆ پێوانــی هــێزی زەرەبیــنی تەلســكۆب لەگەورەكردندا. |
| دينامومێتر | Dynamometer | (دینامۆمیتەر)، ئامرازێكە بۆ پێوانی زەبری هێزی میكانیكی(ئیش كردن) وەكوو لە مۆتۆردا. |
| دينامو، دينام، مولد كهربائي | Dynamo | (دینەمۆ): كارەباخەرەوە: ئامرازێكە بۆ گۆڕینی وزەی میكانیكی بۆ وزەی كارەبایی. |
| دينود | Dynode | (دینۆد): پۆلێكی زیادیە لە زمانەی ئەلیكترۆنی دا بۆ مەبەستی زیادكردنی تەوژمی ئەلیكترۆنی. |
| ديناترون | Dynatron | (دیناترۆن) زمانەیەكی ئەلیكترۆنییە. |
| دينوسيراس | Dinoceras | (دینۆسیراس) گیاندارێكی كەتەی قر تێكەوتووە. |
| ديناصور، دينوصور | Dinosaur | (دینۆسۆر)، گیاندارێكی خشۆكی چوار پێیی كەتەی سەر بچووكی قر تێكەوتووە. |
| ديناصور عاشب، دينصور عاشب | Diplodocus | (دیپلۆدۆكس) دینۆسۆری گیا خۆر. |
| دينار | Dinar | (دینار) دراوێكی (پارەیەكی) كاغەزە دەكاتە (٢٠) پەنجایی یان (١٠٠٠) فلس. |
| ديور الومين | Duralumin | (دیـۆر ئـەلۆمین): دارشـتەیەكە لـە ئەلـەمنیۆم و مـس و مەنگـەنیز، كـەمێك سلیكۆنی مەگنیسیوم و تیادایە، پەیكەری فڕۆكەی لێ دروست دەكرێت. |
| ديونيا، خانق الذباب | Venus fly trap, Fiy catcher Dionea | (دیۆنیا)، مێش خنكێنەر، ڕووەكێكە گەڵا پان و قەراخ دڕكاوییە كە مێش و مەگەزی لەسەر دەنیشێتەوە گەڵاكەی دێتەوە یەك و مێشەكە دەخنكێنێت و هەرسی دەكات. |
| ديواية، قشطة | Cream | سەرتوێژ، قەیماغ. |
| ديوبتومتر | Dioptometer | (دیۆپتۆمیتەر)، پێوەری بینین. |
| ديوبتر | Diopter | (دیۆپتەر)، یەكەیەكە بۆ پێوانی شكانەوەی تیشكی رووناكی لە زەرەبین و ئاوێزە (پوازك) دا. |
| ديوتيرون، ديوترون | Deuteron | (دیۆتـیرۆن): نـاوكی ئـەتۆمیی دیۆتـیریۆم(هـایدرۆجینی قـورس) كـە یـەك پرۆتۆن و یەك نیترۆنی تیادایە. |
| ديوتيريوم | Deuterium | (دیۆتـیریۆم)، هـایدرۆجینی قـورس، هاوتـای هـایدرۆجین: هاوتایـەكی هایدرۆجینە ناوكەكەی یەك پرۆتۆن و یـەك نیوترۆنـی تیادایـە و بارسـتەی ئەتۆمییەكـەی دوو ئـەوەندەی بارسـتەی ئـەتۆمی هـایدرۆجینی ئاسـاییە، نیشانەكەی ( D) یە. |
| ديوسمة، جنبة عطرة | Diosma | (دایۆسما): دەوەنە بۆنخۆش، دەوەنێكە گەڵاكەی بۆنخۆشە گوڵەكەی سپیی یان پەمبەیی یان سوورە. |
| ديود، صمام ثنائي | Diode | (دایۆد)، زمانەی دوانیی، ئامرازێكە دوو پۆلیی هەیە، تێپەڕبوونی كارەبا بە ئاراستەیەكیدا ئاسانترە وەك لە ئاراستەكەی تری هەروەها كریستاڵێكە لە میتاڵی جیرمانیۆم یان سلیكۆن دەشێت كە بۆ گۆڕین كارەبایی( ئەی سی) بۆ (دی . سی) بەكار بهێنرێت. |
| ديوراما | Diorama | (دیوراما)، وێنەیەكە لە دیواری ژوورێكی تاریكەوە تەماشای دەكرێت. |
| ديوريت | Diorite | (دیورایت)، بەردێكی بوركانیی بلوریی (كریستاڵی) یە |
| ديوبسايد | Diopside | (دایۆپسایـد):- بەردێكی بێ رەنگ یان سپی مەیلەو سەوزە بریتییە لە سلیكاتی كالسیۆم و مەگنیسیۆم. |

| | | |
|---|---|---|
| راس الاصبع ، انملة | The tip of the finger | سەری پەنجە، سەری قامك. |
| راسية صدرية | Cephalothorax | سەرسنگی ، ناوچەی سەر و سنگ کە دەبێت بە یەك پارچە وەکو لە قرژاڵدا. |
| راسية اللجام | Head stall | سەر کەللەی وولاخ، بەشێکە لە رەشمەی وولاخ. |
| راسب القاع، ( رواسب القاع) | Pelagic-deposit | قوڕێکە لە بنی زەریاکاندا پاشماوەی گیاندار و ڕووەکە ئاوییە ووردەکانی تیادایە. |
| راسب ، فاشل | Unsuccessful | دەرنەچوو. |
| راسب ( مادة) | Sediment, Deposit, Precipitate | نیشتوو، نیشتە. |
| راسخ، ثابت | Stable, Fixed | چەسپاو، جێگیر. |
| راسي، عمودي | Perpendicular | پۆیی، قیت. |
| راسي، ( راسِ) | Anchored | لە بەندەردا وەستاو( بۆ پاپۆڕ). |
| راسن،َقسط شامي | Elecampane, Inula | ( قەنس) ، ڕووەکێکی پزیشکی تەمەن درێژە لە زەنجەفیل دەچێت . |
| راسنين، اينولين | Inulin | ( ئینۆلین) جۆرێکە لە گلوکۆزید لە ڕووەکی تاڵیشکدا هەیە. |
| راسقي | | راجع رازقی. |
| راسينول | Resinol | ( راسینۆڵ) یەکێکە لە بەرهەمەکانی قەترانی خەڵووز فینۆلی تیادایە. |
| راس | Cephalio, Head | سەر ، سەلك |
| راس ( للجسم) | Apex, top summit | سەری لەش، لوتکە. |
| راسي | Cephalic, Cephalo | سەری ، واتە پەیوەندی بە سەرەوە هەبێت. |
| راسيم | Raceme | ( راسیم)، مادەیەکی کیمایی‌یە توانای گورج و گۆڵی ڕووناکی‌یانەی نی‌یە لە دوو بڕی یەکسان لە ئاوێتەی ڕاستە و چەپە پێکهاتووە . |
| راسمة القلب | Cardiograph | ( کاردیۆگراف) ، ئامرازێکە بۆ تۆمارکردنی لێدانی دڵ ، وێنەگری لێدانی دڵ. |
| راسمة التنفس | Spirograph | ( سپیرۆگراف)، وێنەگری هەناسەدان. |
| راسم الطيف | Spectrograph | ( سپێکترۆگراف)، وێنەگری شەبەنگ. |
| راسم التذبذب | Oscillograph | ( ئۆسیلۆگراف)، وێنەگری لەرە . |
| راسمة الزلازل | Seismograph | ( سیسمۆگراف)، دەزگای وێنەگرتنی بومەلەرزە. |
| راسب جيلاتيني | Gelatinous-precipitate | نیشتووی لینج، نیشتووی جەلاتینی . |
| راسحلبيات | Cephalochordata | سەرپەتکی‌یەکان، کۆمەڵە گیاندارێکن وەکو گیانداری ڕمۆکە (رمج) . |
| راس الديك | Cocks head, Sainfoin | سەرە کەڵەشێر، گیایەکی تەمەن درێژە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە و لەوەڕ دەروێنرێت. |
| راس العصفور | Wild basil, Horse thyme | ڕێحانە کێویلە، سەرە چۆلەکە، جاترەی ئەسپ، جۆرە ڕووەکێکە. |
| راس هرقل، | Pollux, Hercules | سەری هەرقەل، جۆرە ئەستێرەیەکە . |
| راس التوام المؤخر | | |
| راس الافعى، راس احيون | Barbary-ragwort, Life root | سەرەمار، گیایەکی پزیشکی‌یە گوڵی مێخەکی دەگرێت هەر لقێکی تەنها یەك گوڵی بەسەرەوەیە جۆرێکە لە بنە گوزەروان . |
| راس الزاوية | Vertex of the angle | سەری گۆشە . |
| راس التنين، بيقران | Dracocephalum | سەرە ئەژدیها، جۆرە گیایەکە گوڵەکەی بنەوشەیی‌یە لەسەری ئەژدیها دەچێت . |

| | | |
|---|---|---|
| راسوريت ، رازوريت | Rasorite | (راسۆریت)، جۆرێکە لە مادەی بۆراتی سودۆیۆمی ئاوی‌ی سروشتی لە کالیفۆرنیادا هەیە. |
| راس الرمح، راس الحربة | Spearhead | سەرەرم، شلفە، سەری رم، زەرگ. |
| راس الهر، خوذية | Galeopsis, Hemp nettle | سەرەپشیلە ، جۆرە ڕووەکێکە گوڵەکەی ئەرخەوانی مەیلە و سوور یان زەرد یان سپی‌یە ئاوساوی‌یەکی هەیە لەسەر قەدەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت . |
| راس الفخذ، الكرمة | Hip, Head of hemur | نێك، سەری ئێسکی ڕان. |
| راس الشريطية | Scolex | سەری کرمی شریتی. |
| راس ارضي | Head land | سەرەزەوی، پارچە زەوی‌یەکی نوکداری بەرز کە چووبێتە ناو دەریاوە. |
| راس الشيخ | Wild-artichoke | کەرتەشە کێویلە، کنگرە کێویلە، گیایەکی پزیشکی‌یە. |
| راس البراغيث، حشيشة البراغيث | Fleawort | شاهبانج، شابان، گیایەکی کێوی‌ی پزیشکی‌یە گوڵەکەی زەرد و تاڵ و بۆن خۆشە. |
| راس شوكيات، شكائكة الراس | Acantho-cephala | سەر دڕکاوی‌یەکان ، کۆمەڵە گیاندارێکن سەریان دڕکاوی‌یە وەکو جۆرێك لە کرمە دەزوولەی‌یەکان . |
| راسمالي | Capitalist | سەرمایەدار، دەسمایەدار . |
| راسمالية | Capitalism | سەرمایەداری. |
| راسا على عقب | Up side-down | سەرەونخوون، سەر بەرەو خوار. |
| راس قدمي ، راسي قدمي، راسي الارجل | Cepholopoda | قاچ سەری، پێ‌سەری، سەرپێی، گیاندارێکی نەرمە قاچەکانی وان لە لای سەری‌یەوە هەندێك لە بەشەکانی سەری بوون بە جومگەی ئەوتۆ لە قاچ دەچن وەکو هەشت پی (اخطبوط) و سیبیا . |
| رئيس | Gross | ١. ماتماتیك ، ژمارە( ١٤٤) یان (١٢) ، دەستە، دەرزەن، گلۆص.<br>٢. گەورە، سیفەتە بۆ گەورەیی مادی یان پەیوەندی بە گشتگیری‌یەوە هەیە. |
| رئيس الفرقة الموسيقية | Chironom | سەرۆکی تیپی موسیقا . |
| رئيسيات ، اللبائن المقدمة | Primates | گیاندارە سەرەکی‌یەکان، شیردەرە باڵاکان، گیاندارە پێشەنگەکان، هەموو گیاندارێکی شیردەر کە سەر بە پلە سەرەکی‌یەکان بێت کە مرۆڤ مەیمون و مەرمۆزیت و لیمۆر دەگرێتەوە. |
| رئيس فخري ، راس فخري | Honorary president | سەرۆکی شانازیی. |
| راشن | Parasitic-insect, Commensal | هەر مێروویەك مشەخۆر بێت. |
| راشوم | Seal, stamp | شەقڵ، مۆر، تەمغە، دامغە. |
| راشي، راشٍ | Briber | بەرتیل دەر . |
| راشي، طحينة | Dregs of sesame oil | راشی، تەحین، ڕۆن کونجی، جۆرە خواردەمەنی‌یەکە. |
| راشن | Gift | بەخشیش. |
| راشح | Filtrate | پالاوتە، پاڵیو، پاڵفتە. |
| راشح، فيروس | Virus | ( ڤیرۆس) ، میکرۆبێکی بچووکە بە میکرۆسکۆپی ئاسایی نابینرێت . |
| راشد ، بالغ | Mature | پێگەیشتوو، کامڵ. |
| راشة، سويق | Stalk | لاسك، وەکو لاسکی گوڵ و گەڵا. |
| راصد ، رقيب | Observer, Watcher | چاودێر، تێڕوان، ڕووانگەوان. |

| | | |
|---|---|---|
| راصدة ، مرقب، مرصد | Observatory | ڕووانگە، شوێن یان دەزگای تێڕوانینی ئەستێرەکان |
| راض | Contusive | ڕووشێنەر، کوتەر. |
| راطان، رطانية | Rhatany | ( ڕاتان)، درەختێکە تەختەکەی دەکرێت بە کورسی . |
| راعي | Cephei | شوان، جۆرە ئەستێرەیەکە . |
| راعي، راعي الغنم | Shepherd, Herder of Sheep | شوان، شوار، چۆپاڵ، بەرخەوان. |
| راعي البقر او الثيران | Drover, Cowherder, Cowboy | گاوان، کەسێکە بەلای گاران ( گاگەل) دەوە بێت و بیان لەوەڕێنێ. |
| راعي المعز | Goatherd | شوانی بزن. |
| راعي الابل | Herder of Camel | سەروان، ووشترەوان . |
| راعي الطليان | Herder of Lambs , Herdsman | بەرخەوان ، ساوڵەوان، ساوەڵەوان، شوانی بەرغەل. |
| راعي الشاء، عواء | Bootes | شوانی مەڕ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باکوورییە. |
| راعف | Tip of the nose | سەری لووت. |
| راغب | Desirous | ئارەزوومەند، ئارەزووکەر. |
| راغب الخبز، نشوقة، كمون حبشي، سدا | Ajowan, -weed, Picktooth, Tooth pick | ئانخواز، ئانخواه، زیرەی حەبەش، حەوابینج، تۆوێکە دەکرێتە ناو ئانەوە بێن و تامی خۆش دەکات، هەروەها بۆ ژانە سک و سک چوون و پاکردن بەکاردێت . |
| راف | Ruff | ١- ڕەفە، باڵندەیەکی ئاوییە نێرەکەی لە وەرزی جووت گرتندا تەوقێک لە پەڕی ڕەنگاو ڕەنگ لە دەوروپشتی ملی پەیدا دەبێت بۆ مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی مێیەکەی .<br>٢- ڕەفە، ماسییەکی ڕووبارییە. |
| رافنالة ، شجرة المسافر | Ravenala | ( ڕاڤناله)، درەختێکە لە دارخورما دەچێت . |
| رافد، رافد النهر | Branch, Tributary, Regent, affluent, Confluent | چەمار، لقی ڕووبار، ڕووبار ، واژاو، زێ، چەم، چۆم، ڕۆخانە. |
| رافدة | Rafter, Boom | دەسکە، پارچە تەختەیەک بۆ ڕاگرتن. |
| رافدة | Girder | شیش بەند یان داربەست، بۆ خانوو دروست کردن. |
| رافية ، رافيا، نخل الرافية | Raffia-palm , Raphia | دارخورمای ڕافیە، درەختێکە لە کۆمەڵەی دارخورما گەڵاکەی ریشاڵی قایمی لێ دەردەهێنرێت بۆ چنین واتە بۆ دروست کردنی سەبەتە و شەبکە و حەسیر. |
| رافينوز | Raffinose | ( ڕافینۆز)، جۆرە شەکرێکی سیانییە لە چەوەندەر و گێزەردا هەیە ڕەنگەکەی سپییە . |
| رافنية | Rafnia | ( ڕافنیا)، جۆرە ڕووەکێکە بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان. |
| رافانيا | Raphania | ( ڕافانیا)، ژەهراویبوون بە تۆوی تورە کێویلە. |
| راقع، اسكافي | Shoemaker, Cobbler | پینەچی، پینەدۆز. |
| رافعة، عتلة | Lever | نوێڵ، ئامرازێکە بۆ شت بەرزکردنەوە. |
| رافعة، ونش | Crane | نوێڵ ( کرێنە)، بەرزکەرەوە ، سەلنگ ، جەک ، بێرم، برازە، ئامرازی شت سەرخستن، مەکینەی بەرز کردنەوە و هەڵگرتنی شتومەکی گەورە وەک ئوتومبیل و شتی تر . |
| رافعة ، مصعد كهربائي | Lift, Ascenseur | ئەسانسێر، بەرزکەرەوەی کارەبایی. |
| رافعة لولبية | Jack Screw, Screw-jack | جەک، جەکی ئوتومبیل. |

| | | |
|---|---|---|
| راقد ، نائم | Sleeping, Asleep | نوستوو، خەوتوو. |
| راقدة ( دجاجة) | Brooding hen | کورک، کڕ، کڕک، بەکڕ، وەکوو مریشکی بەکڕ. |
| راق، راقي | Elevated, primate | بالاّ، بەرز. |
| راقص، راقصة ، رقاص | Dancer | شەکەڕۆکە، سەماکەر، تیاترۆ، هەڵپەڕ. |
| راقة ، رقا | Lamella | توێژاڵ، تەلاّش. |
| راقود، رقاد | Flat head, Bull-head | سەرپان، ماسییەکی سەرپانە پەرەکەکانی دڕکاوین. |
| راقود | Big jar | خوم، کووپەی گەورە، کووپەیەکی گەورەیە بۆ دروست کردنی سرکە یان ڕەنگ گرتنەوە یان دەباخچێتی بەکاردێت . |
| راقوش | Ramularia | ( رامۆلاریا)، کەڕوویەکی زیانبەخشە بە رووەک. |
| راقون، غرير امريكي | Raccoon, Racoon | ( ڕاکوّن) ، چاڵەگەی ئەمریکی ، چوالووی ئەمریکی ، گیاندارێکە لە ئەمریکا دەژی تووکەکەی خۆڵەمێشی مەیلە و ڕەشە کلکەکەی تیسکنە لەوزی تیژە گۆشت خۆر و شیردەرە لە پشیلە دەچێت زیان بە ڕووەکی گەنمەشامی دەگەیەنێت . |
| راكب، سلك راكب | Rider | رایەر تەل پارسەنگ، تەلێکە بۆ پارسەنگی کێشانی شتومەکی وورد. |
| راكب | Passenger, Cavalier, Rider | سوار، ڕێبوار، ڕووەک. |
| راكد ( للماء) | Stagnant-dull | وەستا، ڕاوەستاو. |
| رال | Young-ostrich | بێچووی ووشترمر. |
| رلم | Myoporum | (مایۆ پۆرەم)، دەوەنێکە گوڵەکەی سپی یان سوورە بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت. |
| رامبوليت | Rambouillet | ( رامبولیت) جۆرە مەڕێکی بیانییە بۆ خوری پەروەردە دەکرێت. |
| رامج، ستارة الصيد | Hunting-screen, Trap | دێوجامەی ڕاوکردن . |
| رامنوز | Rhamnose | ( رامنۆز) ، جۆرە شەکرێکی بلوورییە لە هەندێک ڕووەکدا هەیە. |
| رامس | Nocturnal | شەوگەڕ، هەر گیاندارێکی چوارپەل بەشەو بگەڕێت . |
| رامق ، جلاب | Decoy-bird, Stool-bird | باڵندەی ڕاوی، ئەو باڵندەیەی کە دەکرێت بە چەش یان ڕاوکە بۆ ئەوەی باڵندەی تری پێ ڕاو بکرێت . |
| رامكين | Ramekin | ( رامکین) ، خواردەمەنییەکە لە نان و پەنیر و هێلکە پێک دێت . |
| رامناس، شوك الظبي ، عوسج | Rhamnus | زیی، دڕکەزیی، درەختێکی بچووکە گەڵاکەی دەوەرێت، دڕکاوییە بۆ پەرژین بەکار دەهێنرێت هەندێکی دەرمانی لێدەردەهێنرێت . |
| رامح، رماح | Spearman | ڕم هەڵگر، ڕم هاوێژ. |
| رامح، سماك رامح | Bootis | ئەستێرەی ڕمدار، جۆرێکە لە ئەستێرە. |
| رام | Ram | ( رام)، کەشتییەکی جەنگییە لەوزێکی درێژی هەیە . |
| راموح | Spear fish | ڕمەماسی، جۆرە ماسییەکی دەریایی کەتەی بەهێزە لەوزێکی درێژی هەیە وەک ڕم وایە . |
| رامي بالبندقية | Rifleman | تفەنگەوان، تفەنگچی . |
| رامي السهام | Archer | تیرهاوێژ، تیر ئەنداز . |
| رامي | Marksman, Sharpshooter | نیشانچی، سەکڤان، هاوێژ. |

| | | |
|---|---|---|
| رامي ، قنب سيامي ، قطن الحرير، حشيشة الصين | Ramee-grass, Ramie | گوشی سیام، گیایەکە ریشاڵ لە قەدەکەی دەردەهێنرێت بۆ دروست کردنی گوش . |
| رامي، قوس ، القوس و الرامي | Stagittarius , Archer | تیر هاوێژ ، تیر ئەندازن، کۆمەڵە ئەستێرەییەکە. |
| رانج ، نارجيل ، جوز الهند | Coco-nut-palm, Cocoa-nut | نارگیل، گوێزی هیندی. |
| راندوكس | Randox | ( راندۆکس)، دەرمانی لەناوبردنی گژوگیا. |
| ران، جورب صوفي | Wool-stocking | پووزەوانە، جۆرێکە لە گۆرەوی لە خوری دروست دەکرێت . |
| رانا | Rana | ( رانا) ، جۆرە بۆقێکە. |
| رانكين ، مقياس رانكين | Rankine-scale | ( رانکین)، یەکەی پێوانی پلەی گەرمیی بێ‌پایان ( پەتی) بە پلەی فەهرەنهایتی ، لێرەدا پلەی بەستنی ئاو ( ٤٩١،٤) و پلەی کوڵانی ئاو (٦١٧،٤) پلەیە. |
| رانيولين | Raneolin, Ranioline | ( رانیولین) ، تۆزێکی سپییە لە ئاوی گەرمدا دەتوێتەوە، بریتییە لە مادەیەکی کاربۆهیدراتی لە سەلکی رووەکی داڵیا دەردەهێنرێت دەکرێت بە نان بۆ ئەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشی شەکر دەبن . |
| راهبية، بختية، شجرة البخت، شجرة الرهبان | Glory-tree, Clerodendron | درەختی بەخت، درەختێکە هیندییەکان لە کاتی نوێژکردندا تەختەکەی دەسووتێنن. |
| راهصة بركانية ، رصيص بركاني | Agglomerate | بەردە بورکانی، جۆرە بەردێکی بورکانییە شێوە و قەبارەی هەمە جۆری هەیە. |
| راهوب، سناج | Smut | خەڵوزە، خاڵوزە، نەخۆشییەکی رووەکییە لە گەنم دەدات و دەیکات بە تۆزێکی رەش . |
| راهش | Branchial-artery | بۆری خوێنبەری ژێر باڵ. |
| راوند، روند، راوند ريباس | Rhubarb, Rheum | رێواس، رووەکێکی تەمەن درێژە لە چیا بەرزەکاندا دەروێت سەلکەکەی پێی دەووترێت پەتاتەی شیرین، ، رووەکێکی تەمەن درێژە گەڵاکەی پانە، نێرکەکەی ترشە دەخورێت یان دەکرێت بە مرەبا هەروەها بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت بۆ بەهێز کردنی گەدە و رەوان کردن. |
| راووق، مصفاة | Clarifier, Strainer | پاڵێوە، شیر پاڵێو، پاڵوێنە، پاڕزونگ. |
| راولفين | Rauwolfine | ( راولفین)، مادەیەکی ئەلکالییە لە توێکڵی درەخت دەردەهێنرێت . |
| رايبة | Boiled- Curdled milk | دۆ کوڵیو، جۆرە خواردەمەنییەکە. |
| رايبوسوم | Ribosome | ( رایبۆسۆم) ، بریتییە لە چەند تەنۆچکەیەك بەسەر پەردەی ئیندوپلازمی خانەوە مادەی رایبۆنیوکلیك ئەسید(R. N. A) ی تێدایە ، فرمانی رایبۆسۆم ئەوەیە بە کارگەیەك دادەنرێت بۆ دروست کردنی پرۆتین و ئەنزیم . |
| رايوكس | Rayox | ( رایۆکس)، دووەم ئۆکسیدی تیتانیۆم، لە دروستکردنی بۆیەو کاغەزو لاستیکدا بەکاردێت. |
| راي، سفن ، شفنين بحري | Ray | ( رای)، ماسییەکی گەورەی گۆشت خۆری پانکەڵەیە رەنگەکەی خۆڵەمێشییە، ددانەکانی تیژن. |
| راي لاذع ، راي لساع | Sting Ray | رای چزوودار، جۆرێکە لە ماسی ( رای) چزوویەك یان دوو چزووی ژەهراوی لە ژێر کلکیدا هەیە بە گیانداری تر وەدەدات و دەیکوژێت . |
| راي كهرباني | Electric ray , Cramp fish | رای کارەبایی، ماسییەکە تەوژمێکی کارەبایی دەگرێتە دوژمنەکەی . |

| | | |
|---|---|---|
| راي ، فكر | Opinion, Idea | بیروڕا. |
| راي ، اقتراح | Suggestion | پێشنیار . |
| راية، علم | Flag | بەیداخ، ئاڵا. |
| راية زرقاء | Blue flag | بەیاخە شینە، ئاڵا شینە ، جۆرێکە لە ڕووەکی سوێسنە گوڵی هەمە ڕەنگە دەگرێت . |
| راية شادن، طيارة ورقية | Kite | کۆلارەی منااڵن، فڕۆکەی کاغەز . |
| رايبس ، كشمش | Ribes | کشمیش، ڕووەکێکە بەرەکەی حەڵوای لێ دروست دەکرێت . |
| رايون، حرير صناعي | Rayon | ئاوریشمی دەستکرد. |
| رب | Rob, Rhob, Robb, Stewed fruit | ڕینگ، ڕبە، دۆشاو، ئاوی میوە کە بەگەرم کردن خەست کرابێتەوە . |
| رب الرمان | Pomegranate-rob | ڕبە هەنار، ڕینگی هەنار . |
| رب السوس | Liquorice rob | دۆشاوی بەڵەک. |
| رب العمل | Patron | سەرۆکی ئیش ، کارگێڕی ئیش ، سەرکار. |
| ربا، رباء | Usury | سوو ، سەلەم، فایز. |
| ربائد، ارشيف | Archives | ئەرشیف، بڕوانامە و نوسراوی گرنگ کە پێویستە بپارێزرێت . |
| رباب | Altostratus , White-cloud | هەوری باراناوی ، هەوری بە باران ، هەوری سپی، هەورێکی بەرزە . |
| ربابة | Rebec, Rebab Rebeck | تەموور، ڕەبابە، ئامرازێکی مۆزیقەیە ژێی هەیە بە پەنجە یان بە کەوان لێ دەدرێت . |
| ربالة | Plumpness, Fleshness | گۆشتنی ، خڕپنی. |
| رباح ، جرنيط، زريقاء | Genett, Genet, Civet | ( جێنیت ) گیاندارێکی کێوی گۆشت خۆرە لە پشیلە دەچێت بەڵام گەورەترە و پێستەکەشی وەك پێستی پڵنگە. |
| رباح، ميمون، قردح ، قردوح، حودل | Baboon, Papion | عەنتەر، سەگە مەیمون، نێرە مەیمون، سەگسار، مەیمونێکی ناشرینی کەتەی کلك کروتە. |
| رباح مقدس | Sacred-baboon | عەنتەری پیرۆز، جۆرە مەیمونێکە پیرۆز بۆ لای میسرییە کۆنەکان . |
| رباط | Bond, Band | پێبەست، ، بەند، پەیوەست، پەیوەند، بەستەر، سارغی . |
| رباط وتر | Ligament | ئەو ڕیشاڵانەیە کە ئێسکەکانی جومگە بەیەکەوە دەبەستنەوە . |
| رباط الجرح، ربطة، عصابة، ضماد | Bandage | برین پێچ، سارغی . |
| رباط الحذاء | Shoe-lace, Shoe string | پێتاو، بەندپێی قۆندەرە، قەیتانی قوندەرە. |
| رباط الجوارب | Suspenders for socks, Garter | ئاسقی گۆرەوی ، لاسکی گۆرەوی، گێترە. |
| رباط الكتف ، حمائل | Scapulary | ئاسقی پشت، کە پانتۆڵی پێ هەڵ دەکێشرێت . |
| رباط الرقبة | Scart, Gravat | بۆینباغ، کەرەویتە. |
| رباص | Irrigation by submersion | ئاودان بە ڕێگەی داپۆشینی زەوی بە ئاو . |
| رباطة الجاش، قوة القلب | Cool | نەترە، ئازایی. |
| رباطي | Desmoid | پەیوەندی شانە ڕیشاڵییەکانی وەك شانەی ڕیشاڵەکانی جومگە بەندەوە . |
| رباعي | Quadric-tetra | چوارە، چوارلك، چواری ، چوارهەم. |
| رباعية | Tetra | چوارینە، چوارین. |
| رباعي الاضلاع | Quadri-lateral | چوارلا. |
| رباعي الاثداء | Tetramazia | چوارمەمك، گیاندارێك چوارمەمك یان چوار گۆی مەمکی هەبێت . |

| | | |
|---|---|---|
| رباعي الارجل ، رباعي الاقدام | Quadruped, four-footed, Tetrapod | چوارپێ. |
| رباعي التكافؤ | Tetra valent | چوار هاوهێزی ، توخمێكی كیمیای چوار هاوهێزی هەبێت . |
| رباعي الاسطح | Tetrahedron | چوارڕوو، شێوەیەكی بەرجەستە كە چەند ڕوویەكی تەختی هەبێت وەكو (هرم) قوتەكی ( هرم) سێگۆشە. |
| رباك ، سرب ، حفار | Gilthead | ماسی زێڕیی، ماسی‌یەكی زەریاییە ڕەنگەكەی زێڕییە گۆشتەكەی خۆشە. |
| رباش | Revision | بژاركردن . |
| ربان | Captain, Skipper | ئاژوەر . |
| ربان السفينة | Captain of ship, Shipman, Shipmaster | كەشتیەوان، ئاژوەری پاپۆر، سەرۆكی كەشتی . |
| ربان الطائرة | Captain of airplane | فڕۆكەوان . |
| رُبان مركب صغير | Skipper | كەشتیەكی بچووك . |
| ربان الطين | Mud-skipper | ئاژوەری قوڕ، كەشتی قوڕ، جۆرە ماسی‌یەكی بچووكە لە مارمێلكە دەچێت پەرەكەیەكی گەورەی هەیەبە پشتی‌یەوە، دوو چاوی جووڵاوەی زەقی هەیە خۆی بە سەر قوڕدا دەخلیسكێنێت . |
| ربة | Carobtree | دەوەنی خرنووك . |
| ربة البيت | Mistress | كابان، كەیبانوو، بنەوان. |
| ربت | To pat | دەست بەسەر شان و پشتدا هێنان . |
| ربح | Profit, Benefit, Interest | قازانج ، قانجاز، قازاج، سوود، دەرامەت . |
| ربح المال ، فائدة قانونية | Interest | سوودی پارە. |
| ربح بسيط | Simple-interest | قازانجی سادە، قازانجی كەم . |
| ربح مركب | Compound-interest | قازانجی ئاوێتە، قازانجی زۆر . |
| ربد ، عين الثور | Ox eye | چاوەگا، جۆرە ڕووەكێكە گوڵەكەی زەردە لە گوڵەبەڕۆژە دەچێت . |
| ربش، ابيضاض الاظافر | Leukony chia | پەڵەی سپی سەر نینۆك. |
| ربض ، حظيرة ، ماوى الغنم | Fold pen | گەوڕ، پشتێر، گەلەخان . |
| ربرق، عنب الذئب، عنب الثعلب ، ثلثلان، عليق ، توت بري | Black night-shade, Solonum, Nigrum, Black berry, Hound | تریێ گورگ تریێ ڕێوی ، تووترك ، دەوەنێكی دڕكاوی‌یە گوڵەكەی بنەوشەی‌یە بەرەكەی ڕەشە دەخورێت. |
| ربط | Ligation , Association | بەستن، بەستنەوە، گرێ دان، جەلە. |
| ربطة ، لفاع | Muffler, Veil | مل بەست ، سەرپۆش . |
| ربطة ، رابطة | Linkage | پەیوەست، پەیوەند، بەند. |
| ربطة الرقبة | Tie | بۆینباغ، كەرەوێت، مل بەند، بەندۆك، مل پێچ. |
| ربط الخلايا على التوالي | Connection of Cells in Series | بەستنی خانەكان یەكو لە دوای یەك، دوابەدوا بەستنی خانەكان . |
| ربط الخلايا على التوازي | Connection of Cells in Parallel | هاورێك بەستنی خانەكان . |
| ربض | Fence | حەسار، شوورە . |

| | | |
|---|---|---|
| ربع | Quarter | چواریەك، چارەك. |
| ربعية، ربع الدائر | Quadrant | چارەكە بازنە، چارەكی بازنەیەك. |
| ربع الاول ، التربیع الاول | First Quarter | چارەكی یەكەم لە شێوەی هەیڤ ( مانگ) دا . |
| ربع الثاني، التربیع الثاني | Last quarter | چارەكی دووەم وەكو لە شێوەی هەیڤ ( مانگ) دا. |
| ربعة ، حمى الربع | Quarter-fever | چوار یەرۆ، جۆرێكە لە نەخۆشی لەرزوتا . |
| ربقة | Lasso, noose | دووگمە، قۆپچە، بشكوور ، قولفە، گرێ |
| رقي | Plotax | ( پلۆتاكس) جۆرە ماسییەكی بچووكی ڕەنگینە. |
| ربل | Plump, Fleshy | گۆشتن ، خڕین. |
| ربل، قرص الغراب | Ink plant, Ink berry | خەپلەی قەلەڕەشكە، جۆرە درەختێكە لە ووشكانیدا شەق دەبات بەرەكەی لە تریێ دەچێت ڕەنگێكی شینی تایبی لێدەردەهێنرێت . |
| ربل، برنجاسة ، شویلاء، برنجاسف ، بعیثران ، حبق الراعي | Artemisia-Vulgaris | رەیحانە شوانە، ڕووەكێكی تەمەن درێژە گوڵەكەی سپی و بچووكە بۆنێكی تیژی هەیە بۆ دەرمان بەكاردێت . |
| ربلة الساق ، سمانة الرجل ، بطة الرجل | Calf of the leg<br>Hock | ١. پووز ، نەرمایی قاچ ، بەڵەك ماسولكەی قاچ .<br>٢. جومگەی پاشۆی دواوەی ووڵاخ . |
| ربو | Asthma, Asthenia | نەخۆشییەكی تەنگە نەفەسی ییتەنگی، نەخۆشی هەناسە توندی و كۆكە، ووروژاندنی پەردەی ناوەوەی ئەندامەكانی هەناسەی لەگەڵدایە، گەلێ جۆری هەیە ، هەناسە سواری ، پشوسواریی ، لاتە، جۆرە هەستیاتییەكە دەبێتە هۆی پژمین و لووت گیران و هەلاّمەت لە ئەنجامی هەڵمژینی خوڵ یان دووكەڵ یان گازی تیژ و تووین یان بۆنی هەلاّلەی گوڵ یان پەینی ئاژەڵ یان هەندێ خواردەمەنی . |
| ربو ا لخيل | Heaves | تەنگە نەفەسی ووڵاخ، نەخۆشییەكی درێژە كێشی كوشندەیە لە سییەكانی ووڵاخدا . |
| ربو الحشیش ، حمى الدریس | Hay Asthma | جۆرێكە لە هەناسە تەنگی، بە هۆی بۆن كردنی پووش و كاوە دەبێت . |
| ربوط ، انسان الي | Robot | مرۆڤی ئالی مرۆڤی ئوتۆماتیكی . |
| ربوة، رابیة، اكمة ، تل | Hill, Monticle, Hillock, Mesa | بەرزایی ، گرد، قەلاّت. |
| ربوة قناة ، ربوة ذات حلمة | Mamelon, ( in French Demoiselle) | گردۆڵكەی كەنیشكە: گردۆڵكەیەكە لوتكەیەكی تیژی بازنەیی هەیە لە گۆی مەمك دەچێت . |
| ربوة، عشرة الاف | Myriad | دە هەزار . |
| ربوض | Kneeling-down | هەلاّس بوون، چۆك دادان . |
| ربیة النخیل | Palmer worm, Palm beetle | قالۆنچەی دارخورما، جۆرە قالۆنچەیەكی قاوەییە زیانبەخشە بە ڕووەكی وەكو دار خورما . |
| ربیع | Spring | بەهار، یەكێكە لە چوار وەرزەكەی ساڵ لە (٢١)ی مارتەوە هەتا (٢١) ی حوزەیران ، لەم وەرزەدا شەو و ڕۆژ وەك یەك دەوەستێ و هەوا خۆش دەبێت و زەوی سەوز دەبێت. |
| ربیعي | Vernal | بەهارە، بەهاری . |
| ربیطة | Sacrifice, Fattened, Stall-feed | دابەستە، دانی ، پەرواری ، دەرماڵە، دابەستی . |
| ربیكة | Slime | قوڕاو، شێلی. |

| | | |
|---|---|---|
| ربيدان، رجل الطير | | پێباڵندە، گیایەکی کێوییە بۆ لەوەڕ باشە بەرەکەی لە پێی باڵندە دەچێت . |
| رِبيل | Portly, Plump, Fat and rounded | خڕین، خڕت ، خڕپلانە، خڕکەلە، تێکسمراو. |
| رت، عفر ، حلوف ، رث، خنزير بري | Pig, Pore | یەکانە، بەرازی نێرە ، بەرازە کێوی |
| رتابة ، رتوب، روتينية | Routinism | ڕۆتین ، لەسەر یەك شێواز . |
| رتاج | Portico, Frame | دەروازە، دالان، کوزەرکە |
| رتاج متحرك ، بوابة | Gate | دەروازە، دەرگایەکی گەورە کە بجوڵێت . |
| رتاجة ، علم الصخور | Lithology | زانستی بەرد ( بەرد ناسی) . |
| رتافية | Ratafia | ( راتافیا)، جۆرێکە لە مەی هەروەها لە پسکویت . |
| رتبة، درجة | Degree, Grade | پلە، نمرە. |
| رتبة | Order | پایە، مەقام، پلە، هۆز، کۆمەڵە گیاندارێك لە هەندێك سیفەتدا لە یەکتر بچن وەکو گیاندارە سەدارەکان. |
| رتبة اكلة الحشرات | Insectivora | پلەی مێروو خۆرەکان ( مێروولەخۆر). |
| رتبة اللبائن المجنحة | Chiroptera | پلەی شیردەرە باڵدارەکان ( شەمشەمەکوێرە) . |
| رتبة الضواري | Carnivora | پلەی درندەکان ( گورگ) . |
| رتبة القوارض | Rodentia | پلەی قرتێنەرەکان ( مشك) . |
| رتبة الحيتان | Cetacea | پلەی نەهەنگەکان ( نەهەنگ) . |
| رتبة الخرطوميات | Proboscidea | پلەی لمۆزدارەکان ( فیل) . |
| رتبة اللبائن البيوضة ، رتبة اللبائن احادية الفتحة | Monotremata | پلەی شیردەرە هێلکەکەرەکان ( دەنووکە مراوی) . |
| رتبة الكيسيات | Marsupialia | پلەی توورەکەدارەکان ( کەنگەر) . |
| رتبة وترية الاظلاف | Perissoodactylous | پلەی تاك سمەکان ( وولاّخ) . |
| رتبة شفعية الاظلاف | Artiodactylous | پلەی جووت سمەکان ( مەڕ و مالآت) . |
| رتبة النعاميات | Struthiones | پلەی ووشترمرەکان ( وشترمر) . |
| رتبة الوزيات | Anseriformes | پلەی قازەکان ( قاز و مراوی ) . |
| رتبة اللقلقيات | Ciconiiformes | پلەی لەقلەقەکان ( حاجی لەقلەق) . |
| رتبة الدجاجيات | Galliformes | پلەی مریشکەکان ( مریشك) . |
| رتبة الحماميات | Columbiformes | پلەی کۆترەکان( کۆتر) . |
| رتبة الصقريات | Falconiformes | پلەی هەڵۆکان ( باز و هەڵۆ) . |
| رتبة العصافير | Passeriformes | پلەی پاسارییەکان ( چۆلەکە) . |
| رتبة عديمة الارجل | Apoda | پلەی بێقاچەکان ، ووشکاوەکی بێ قاچ . |
| رتبة الذنبيات | Acaudata | پلەی کلکدارەکان ( قورناویلکە)، سەمەندەل. |
| رتبة القفازات | Salientia | پلەی بازدەرەکان ( بۆقی کێوی) . |
| رتبة الخطراسيات | Rhynchocephalia | پلەی سەر لمۆزییەکان، گیاندارێکە لە مارمێلکە دەچێت سەرەکەی لمۆزدارە. |
| رتبة المدرعات | Loricata | پلەی قەڵغاندارەکان، وەکو قەڵغاندار (مدرع). |
| رتبة السلاحف | Cholonia | پلەی کیسەڵەکان. |

| | | |
|---|---|---|
| رتبة الحرشفيات | Squamata | پلەی پوولەکەیی، پولەکەدارەکان. |
| رتبة التماسيح | Crocodilia | پلەی تیمساحەکان. |
| رتبة جلدية الاجنحة | Dermaptera | پلەی باڵ پێستی‌یەکان ( مێروو) . |
| رتبة مستقيمة الاجنحة | Orthoptera | پلەی باڵ ڕێکەکان ( مێروو) . |
| رتبة متساوية الاجنحة | Isoptera | پلەی باڵ یەکسانەکان ( مێروو) . |
| رتبة غمدية الاجنحة | Coleoptera | پلەی باڵ کالانی‌یەکان ( مێروو) |
| رتبة حرشفية الاجنحة | Lepidoptera | پلەی باڵ پوولەکەی‌یەکان ( مێروو) . |
| رتبة مزدوجة الاجنحة | Diptera | پلەی جووت باڵی‌یەکان ( مێروو) |
| رتبة مخفية الاجنحة | Siphonoptera | پلەی باڵ شاراوەکان( مێروو) . |
| رتبة غشائية الاجنحة | Hymenoptera | پلەی باڵ پەردەی‌یەکان ( مێروو) . |
| رتبة المقدمة | Primates | پلـەی سـەرەتا ، پلـەی پێشـەنگ، پلـەی باڵاکـان، کـە مـرۆڤ و مـەیمون دەگرێتەوە . |
| رتباج، رتباغة | Rutabaga | شێلمی سویدی ، شێلمی زەردە. |
| رتج، جراب | Pouch | توورەکە، کیسە . |
| رتخة | Slime | قوڕاو، چڵپاو، لیتە. |
| رتبة، قنفذ البحر، توتيا البحر | Sea-urchin | ژیشکی دەریا. |
| رتق | Atresia | داخران، کوێربوونەوە، نەبوونی کون لـە ئـەندامی لەشـدا بـە شـێوەیەکی زگماکی وەکو نەبوونی کونی بیلبیلەی چاو . |
| رتق ، رفو | Darning, Topatch | دوورینەوەی جل. |
| رتل موجي | Wave train | زنجیرە شەپۆلێك کە هاوتا بن لە خێرایی و زەبر و فراوانیدا . |
| رتل ، طابور | Queue, File | تابوور، بەشێك لە لەشکر. |
| رتم، جولق، بدسكان، وزال | Furze, Retem, Retama, Spanish-broom grass, Spartium | ( ڕەتم) ، جۆرە درەختێکە گوڵەکەی لە شەوبۆ دەچێت لقی زۆر و بێ‌گەڵایە گوڵەکەی زەردە بەرەکەی لە نیسك دەچێت بۆ مەبەسـتی پـەرژینی بـاخ و دەرمان بەکاردێت . |
| رتيلاء | Tarantula | جاڵجاڵۆکـە زەردە، کـاردی ، جۆرە جاڵجاڵۆکەیـەکی ژەهرینـە قـاچ و پـەل درێژە ڕەنگەکەی زەردە وەك دووپشك پێوەدەدات . |
| رتيلاوات | Araneida | جاڵجاڵۆکەی‌یەکان کۆمەڵەی جاڵجاڵۆکە کە چەند جۆرە گیاندارێك دەگرێتەوە . |
| رتيب، روتين | Routine | ڕۆتین ، لەسەر یەك شێواز . |
| رتيبة | Sub-order | ژێـر پلـە، پایۆکـە، مەقانۆکـە، پایـە یـان مـەقانێکی بچـوك، پلەیەکـە لـە پلەکانی پۆل کردنی زیندەوەردا دەکەوێتە دوای پلە و پێش پەل . |
| رتيمة | Climbing-fern | جۆرێکـە لـە ڕووەکـی کـەرەوزە کێویلـە ( سـرخس) خۆهەڵواسـەرە بـۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت . |
| رتينة المصباح | Incaudescent Mantle | پلیتـەی گلۆپ، بریتی‌یـە لـە ئەتـەمێکی لولـەیی لـەناو گلۆپـدا ئۆکسـیدی میتالی تێدایە . |
| رتينة، ريتينة | Rhytina | ( رایتینا)، جۆرێکی کەتەیە لە مانگای دەریا درێژیەکەی نزیکەی (٧-٩) مەتر دەبێت و نزیکەی (٤) تەن قورسە، بەرەو نەمان دەچێت . |
| رتين | Retene | ( ریتین) ، مادەیەکی هایدرۆکاربۆنی‌یە لە قەترانی خەڵووز دەردەهێنرێت هەروەها لە داری سنەوبەر . |
| رث ، رثيث | Ragged | دڕاو، پەڕپووت، کۆن ، کەڤن. |

| | | |
|---|---|---|
| رث، رت | | راجع ( رت) . |
| رشة | Ashower of Rain | نمه باران، تاوی باران. |
| رشة | Rhytisma | ( ريتيسما)، كەڕوويەكی زيان بەخشە بە ڕووەك. |
| رثية، التهاب المفاصل، روماتيزم | Arthritis, Rheumatism | باداری، رۆماتيزمە، سووتانەوەی جومگە. |
| رج | Shaking | ڕاوەشاندن ، تێكهەڵدان، شڵەقاندن، هەژاندن، ڕاتەكاندن. |
| رجاجة، غربال اهتزازي | Shaker | بێژنكی لەرۆك. |
| رجاجة، ماكنة الرج | Shaking-machine | مەكينەی شڵەقاندن يان ڕاوەشاندن. |
| رجبة ، دعامة | Prop, Stake | كۆڵەكەی ڕووەك ، ئەو دارەی كە وا دەچەقێنرێت بۆ ڕووەكی خۆهەڵواسەر. |
| رجل الاطفاء | Fireman | ئاگر كوژێنەوەكان، فەرمانبەری ئاگر كوژاندنەوە . |
| رجة، صدمة | Shock | ڕاتەكان، هەژان. |
| رجة مخية، رجة المخ | Concussion of the brain | ڕاتەكانی مێشك، پشێوی لە فەرمانەكانی مێشكدا لە ئەنجامی لێدانێك يان ڕاوەشاندنێك لە سەرداو دەبێتە هۆی سەرەگێژە و دڵ تێكەڵ هاتن. |
| رجة كهربائية | Electric-shock | ڕاتەكاندنی كارەبايی. |
| رجرج | | ريشە بزن، دەوەنێكە گەڵاكەی خۆڵەمێشی‌يە گوڵەكەی زەردێكی كاڵە لە ناوچە بيابانە گەرمەكاندا دەڕوێت لەوەڕێكی باشە بۆ ئاژەڵ . |
| رجرج | Aspen tree | دار چنار، سپيدار. |
| رجراج، مترجرج | Quivering Tremulous | لەرۆك، دەلەدەلكەر. |
| رجع، نكس | Relapse, Return | گەڕانەوە. |
| رجع الصدى | Reecho | دەنگ دانەوە، زايەڵە. |
| رجعي | Reactionist, Retrogressive | پاشگەزی. |
| رجفة، رعشة | Aquiver, Quake, Thrill, Jerk, Shiver, Shudder | تەزوو، لەرزەك، لەرزە، مووچڕك، لەرزين، مووچڕكە، دانەچۆقێ. |
| رجفة تشنجية | Couvulsion | لەرزين بە كۆڵنجەوە . |
| رجفة | Tremor | بوومەلەرزەيەكی سووك يان كز. |
| رجفة الركبة | Knee-Jerk | لەرزينی ئەژنۆ ئەگەر شتێكی پيا بكێشرێت . |
| رجفان | Trembling , Flutter | لەرزين . |
| رجل | Man | پياو، مەردوم، مێرد. |
| رجل الفضاء | Spaceman | پياوی بۆشايی، كەشتيەوانی بۆشايی ئاسمانەوان . |
| رَجل، راجل | Pedestrain | پيادە، كەسێك بەپێ بڕوات . |
| رجل الحرب البرتغالي، بارجة برتغالية | Portuguese man of war | پياوی جەنگی پورتوگالی، كەشتی پورتوگالی، جۆرێكە لە گيانداری هايدرا واتە چرای دەريا بە هۆی ميزڵلأنێكی پڕ هەواوە كە لە چارۆكە دەچێت سەر ئاو دەكەوێت شاخۆچكەی درێژ و چزووداری هەيە بۆ خوارەوە شۆڕبوونەتەوە ماسيان پێ دەگرێت . |
| رجل الثلج ، انسان ثلجي | Snow man | پياوی بەفر، گيانداركێكە گوايا نيمچە مرۆڤ و نيمچە مەيمونە لە شاخی هيمالايا دەژی شوێن پێيەكەی لە بەفردا بينراوە. |
| رجل كلبي | Cynic man | سەگ پيار، ئەو كەسەيە كە وەكو سەگ لە جياتی هەناسە زمانی ڕادەوەشێنێت . |
| رجل متأنث، رجل متخنث، مخنث، شبه المراة | Effeminate, Gynader | خلەژنانی، پياوی ژنانی . |

| | | |
|---|---|---|
| رجل ، رجل صناعية | Leg, Pylon | پەل، لاق، قاچ، پاشوو، لنگ، قاچی دەستکرد. |
| رجل الفيل ، نبات السلحفاة | | پێی فیل، پێ‌فیلە، جۆرێکە لە دارمێو گوڵەکەی وردە رەگەکەی ئەستوورە دەخورێت ، هەروەها بە جۆرە گیایەك دەوترێت . |
| رُجلة، فرقة | Troop | پۆل، گەلە. |
| رجل وهمية ، رجل كاذبة | Pseudopodium | قاچە درۆزنە، گەندەپێ، درۆزنەپێ، وەکو لە گیانداری ئەمیبادا هەیە. |
| رجل الغراب ، سرفيل، معدنوس الفرنجي | Chervil | شنگ، پێ‌قەلە، گیایەکی بەهارییە تامی گەڵاکەی وەکو گەڵای توور وایە دەخورێت گوڵەکەی سپییە و بەرەکەی ورد و رەش و بۆن خۆشە بۆ مەبەستی چارەکردنی نەخۆشی پێست بەکاردێت . |
| رجل الاسد ، حشيشة الفضة | Alchemilla-Vulgaris | پێی شێر، گیازیو، رووەکێکی تەمەن درێژی تووکنە لە مێرگدا دەروێت گەڵاکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| رجل ملقيطة، رجل كلابية | Cheliped, Chelicera | قاچی مقاشی ، قاچی ماشەیی. |
| رجل الحمام، كنهان صباغي ، جذر الشنجار، خس الحمار | Alkanet, Blistering-ammania | پێ‌کۆترە ، کاهووە کەرانە، گیایەکە رەنگێکی سووری لێ‌دەردەهێنرێت . |
| رجل الذئب ، خدرية | Wolf<br>Lycopodium, Club-moss | پێ‌گورگە، جۆرە رووەکێکی بێ‌گوڵە. |
| رجل قنطورس ، حضار | Columba | ( کولەمبا ) ، جۆرە ئەستێرەیەکە. |
| رجل الجبار ، رجل الجوزاء اليسرى | Rigel | قاچی چەتەوول، ئەستێرەیەکی ئەگەرۆکە لە بورجی چەتەوول. |
| رجل العصفور | Sparrow-foot | پێ چۆلەکە، گیایەکە گەڵاکەی وەکو کەرووزە وایە گوڵێکی زەردی ورد دەگرێت . |
| رجل مفصلية | Arthropoda | پێی جومگەیی. |
| رجل امامية | Foreleg | پێشوو، لاقی پێشەوە، قاچی پێشەوە . |
| رجل فكية | Jaw-foot, Maxillipot | قاچی شەویلگەیی. |
| رجل الدجاج، عرق النجيل | Dactylus-officinalisvill,<br>Cynodon-dactylonpers | پێ مریشکە، چنگە مریشك، گیایەکی بەهارییە گەڵاکەی وەکو پێی مریشك پەرەدارە. |
| رجل الدب | | پێ‌وورچە، لەپی وورچ، گیایەکی کێوییە گوڵی سپی دەگرێت گەڵاکەی وەکو گەڵای کاهوو پانە ئاژەڵ دەیخوات . |
| رجلة الازهار، رجلة زينة | Ornamental-purslane | نازنازە، جۆرێکە لە پەڵپینە گوڵی هەمەرەنگی جوانی هەیە . |
| رجل القط، رجل الهر | Gnaphalium | پێ‌پشیلە، جۆرە گیایەکە گەڵاکەی بچووك و تیژە و مووی پێوەیە و بە شێوەی هێشووە . |
| رجل الجوزاء | Orionis, Orion | ( ئۆریۆن ) ، لاقی کەشکەلان، جۆرە ئەستێرەیەکە . |
| رجل صفاقية ، قدم صفاقية | Webbed foot | پێی پەردەدار، پێی چەقدار وەکو لە بۆقدا . |
| رجل الاوز | Goose foot, Chenopodium | ١. پێ‌قازە، گیایەکی خۆهەڵواسەرە بۆ مەبەستی خواردن و پزیشکی بەکاردێت ، گەڵاکەی دەماری زەردی تیادایە .<br>٢. رووەکێکی خۆهەڵواسەرە لاسکی درێژ و رەنگی هەوایی هەیە گەڵاکەی دەماری زەردی تیادایە بۆ مەبەستی رازاندنەوە بەکاردێت . |
| رجل الطير | Serradella | پێ‌باڵندە، رووەکێکە بۆ لەوەڕ باشە . |
| رجل القبرة | Garden-larkspur | پێ‌کلاوکورە، جۆرە رووەکێکە |

| | | |
|---|---|---|
| رجل مجنحة | Pteropodium | قاچی باڵدار، قاچێکە پەردەیەکی پێوەیە بە لەش گیاندارەکەوە نوساوە وەکو لە شەمشەمەکوێرەدا . |
| رجل الارنب ، نفل البر | | سێپەڕەی زەوی ، پێکەرۆێشکە جۆرێکە لە سێپەڕە. |
| رجلة ، فرفح بقلة حمقاء، رجلة الكف ، فرفحين | Purslane, pussley weed | پەڵپینە، رووەکێکە لە سەرەڕێ و کێڵگەدا دەڕوێت و دەکرێت بە چێشت یان زەڵاتە . |
| رجم ، رمي بالحجارة | Stoning | بەردەباران، رەجم کردن . |
| رجم، حجر نيزكي | Meteorite | بەردی ئەستێرەی کشاوی گەورە کە دەکەوێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی . |
| رجمة ، شاهد القبر | Grave stone, Cairn | کێلی گۆڕ. |
| رجولة | Manhood, Virility | پیاوێتی ، توانایی پیاو بۆ سك پڕکردنی ژن . |
| رجوعية ، مرونة | Resillence | جیڕیی، گەڕانەوەی هەر تەنێك بۆ شێوە و قەبارە سەرەتاییەکەی خۆی دوای گوشینی یان پەستانەوەی. |
| رجولية ، ترجل ، استرجالية | Virlism, Masculism | نێرە کوڕانێتی ، دەرکەوتنی هەندێك سیفەتی پیاوێتی لە ژندا وەکو دەنگ گڕی و سمێڵ. |
| رجيم ، حمية | Regime | ( رێجیم ) ، پارێزکردن لە خواردن . |
| رجيع | Out of Season | بێوەرز ئەو بەروبوومەی ( میوە یان سەوزە کە لە جگە لە وەرزی خۆیا دێتە بەرهەم) . |
| رحا، رحي، سبيناغ | Spinach | سپێناغ ، گیایەکە لە سلق دەچێت دەکرێت بە چێشت . |
| رحي ، ضرس | Molar | خرێ، جۆرێکە لە ددان . |
| رحاقي ، رحيقي | Melliferous, Nectareous | شیلەدار، رووەکێك گوڵەکەی شیلەدار بێت. |
| رحاة ، رحي ، رحاية ، جاروشة | Stone hand-mill, Quern, Mill stone | دەستاڕ، هاڕە، تەپ، گیرۆسە. |
| رحاء ، حمل كاذب | Pseudo-Pregnancy | سك پڕبوونی درۆزنە، باسك پڕبوون ، شەیتان ئاوس . |
| رحال ، مستكشف | Explorer,Traveller | گەڕۆك، گەڕیدە. |
| رحال ، بدوي | Nomad | کۆچەر. |
| رحاء ، قدم رحاء | Talipes-planus | پێی پان . |
| رحام ، التهاب الرحم | Uteritis, Meteritis | ئاوسانی منداڵدانی ئافرت . |
| رحب ، عريض ، واسع | Wide | فراوان ، پان . |
| رحبة السيارات | Park( motor-car) | پارکی ئوتۆمبیل ، شوێنی ئوتۆمبیل وەستان. |
| رحبة | Square | ١. بەردەرگا.<br>٢. شوێنی ووشك کردنەوەی میوە . |
| رحض، سقي، ري | Irrigation | ئاودان، شتنەوە. |
| رحضة، حقنة | Lavement | حوقنە. |
| رحضة ، حقنة شرجية | Enema | حوقنەی کۆم . |
| رحض معوي | Enteroclysis | حوقنەی ریخۆڵە . |
| رُحَضاء ، كثرة العرق | Desudation | ئارەق زۆر کردنەوە ، زۆر ئارەق کردنەوە . |
| رَحل، سرج ، قتب | Pack Saddle | کورتان ، زین . |
| رَحل، امتعة | Luggage | کەل و پەل ، باروبارخانە . |

| | | |
|---|---|---|
| رحل ، فربيون كمثري اللون، لبين كمثري اللون | Euphorbia-apois | شیرماری ڕەنگ هەرمێیی، ڕووەکێکی کێوی پزیشکییە ڕەگەکەی ئەستوورە ڕۆنێکی سووکەڵەی لێدەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی . |
| رحلة ، مائدة الكتاب | Desk | کورسی قوتابی ، مێزی خوێندن . |
| رحلة قنص | Safari | چوونەڕاو، گەشتی ڕاوکردن |
| رحلة علمية | Field trip | گەشتێکی زانستییانە . |
| رحلة ، سفرة | Journey, Travel | کۆچ، گەشت . |
| رحلة ( هجرة) الايونات | Migration of ions | کۆچی ئایۆنەکان . |
| رحم | Uters, Womb, Metra | منداڵدان، پزوو، شیلاف، پزو، بەچەدان، پسدان، منداڵدان ، پزان، پزدان، پزانك، پاوور، جامەدان، ئەندامێکی ماسولکەیی بۆشە لەناو سکی دایکدا منداڵەکەی تێدا دەبێت هەتا کاتی لە دایك بون . |
| رحوية | Capstan | ئامرازێکە بۆ بەرزکردنەوە یان ڕاکێشانی شتی گەورە . |
| رحوية المناجم ، ناعورة | Noria, Water-wheel | جەنجەڕی ئاو، بریتییە لە پێچکەیەکی گەورە چەند باڵێکی هەیە وولاخی پێوە دەبەسترێت بۆ ئاو هەڵهێنجان لە بیر. |
| رحى | | راجع (رحاه) |
| رحى | Molar | خڕێ، ددانی دواوە کە خواردن دەهاڕێت . |
| رحيق، رحيق الزهرة | Delicious, Nectar | شیلەی گوڵ . |
| رحيقاني، دراق، خوخ، احمر مايس | Nectarine, Peach | قۆخ، شەفتالی ، شەفتالوو . |
| رحيل ، هجرة | Emigration | کۆچ کردن . |
| رُخ | Roc, Rukh | سیمرخ، باڵندەیەکی قڕتیکەوتوو یان ئەفسانەیە . |
| رخ مصري ، بجمة | Griffon | سیمرخی میسری . |
| رخاوة | Softness | فشەڵی ، فشۆڵی. |
| رخاء، يسر | Abundance, Plenty | هەرزانی ، خۆشگوزەرانی . |
| رخاء ، مدغدغة | Gentle breeze | جۆرە بایەکە خێراییەکەی (٤ ) مەترە لە چرکەیەکدا . |
| رخاخ | Quagmire | زەوییەکی فشەڵ کە قاچی تێدا نقوم بێت . |
| رخاخ، عرف الديك | Rhinanthus | پۆپنەی کەڵەشێر ، گیایەکە گوڵی زەرد یان سوور دەگرێت . |
| رخام ، كاربونات الكالسيوم ، مرمر | Marble | خارا، مەڕمەڕ، کاربۆناتی کالسیۆم ، جۆرە بەردێکە بۆ مەبەستی خانوو پەیکەر دروست کردن لە کانزای کالسایت و دۆلۆمایت پێك هاتووە. |
| رخام سماقي | Porphyry | خارای سماقی، جۆرە بەردێکە . |
| رَخد ( كساح) | Rickets | ئێسك نەرمی، نەخۆشییەکە . |
| رُخص | Cheapness | هەرزانی ، ئەرزانی . |
| رخصة ، إذن | Permission | پشوو، ماوە، ماوەپێدان . |
| رخفة ، حجر الخفان | Pumice-stone | بەردەپێ، بەردێکی خاوی سووکی ڕەشە بریتییە لە مەگنیسیوم سلیکەیت سەبیل و نێرگەلەی لێ دروست دەکرێت، کرێشی پێی پێ لادەبرێت . |
| رخل | Ewe-lamb | بەرخ، بەرخەمێ. |
| رَخم | Incubation | کڕکەوتنی باڵندە. |
| رخم ، رخيم (للصوت) | Euphonic, Soft, Melodious, Mellow | دەنگێکی هێمن . |

| | | |
|---|---|---|
| رخمة، شوحة، انوق، بغاث | Egyption-vulture, Neophron | خەردالْ، کەرگەز، لاشەخۆر، دالە کەرخۆر، دالّی سەرسپی، دالاش، پیرۆزە ، کەرخۆرە، جۆرە سیسارکێکی پەلەپەلەیە پەرمکەی بالّی سپی و رەش و زەرد کلکی سپییە دەنووکی خۆلەمێشیيە ، قاچی خۆلەمێشی مەیلە و زەردە لاکی گیانداری تۆپیو دەخوات . |
| رخمة صفراء، شوحة | Griffon-vulture | خەردالّی زەرد. |
| رخو | Relaxed, Limp, Soft, Lax, Flabby, Flaccid | خاو، فشەلّ ، فش، پشۆش، فشۆلّ، گۆشەك، شل. |
| رخو العظام، لين العظام، كساح | Rachitis, Rickets | ئێسك نەرمی، نەخۆشی‌یەکە . |
| رخودة | Osteomalacia, adult, rickets | نەخۆشی ئێسکە نەرمە لەگاو مانگادا . |
| رخويات، حيوانات رخوة، نواعم | Mollusca, Molluscs | گیاندارە نەرمەکان (نەرمۆڵەکان)، کۆمەڵە گیاندارێکی نەرمن زۆربیان دەریایی یان ئاوین وەك گوێچکەماسی و شەیتانۆکە ، قاقڵەیان لەپکە ( سەدەف) یان هەیە. |
| رخوصة العين | Ophthalmom-alacia | سیلی چاو . |
| رخيص | Cheep, Low priced | هەرزان ، ئەرزان ، ئارزان . |
| رخيم ( للصوت) | | راجع ( رخم). |
| رَد ، إرجاع | Returning, Reflex, Restitution | دانەوە، گەراندنەوە. |
| رد | Rudd | ( رەد) ، جۆرە ماسی‌یەکە. |
| رد، تفنيد | Refutation | بەرپەرچ دانەوە . |
| رد الحياة | Resusilation | گەراندنەوەی ژیان بۆ کەسێك بە رێگەی شیلانی دلّ. |
| رد الفعل | Reaction | بەرپەرچ ، رەت کردنەوە، وەرام، کاردانەوە، بەرکار. |
| رِداء، عباءة | Mantle | کەوا، عەبا . |
| رداء، ثوب | Garb, Dress, Garment robe | جلوبەرگ ، کراس . |
| رداء جامعي، روب جامعي | Robe | بەرگی زانکۆیی، ئەو بەرگە تایبەتی‌یەی کە مامۆستا و قوتابی زانکۆ لە کاتی ئاهەنگدا لەبەری دەکەن . |
| رَداءة | Badness | خراپی ، بەدی، گەندی. |
| رداسة | Cynonycteris | جۆرێکە لە شەمشەمەکوێرە. |
| رداح، ذات الية كبيرة | Fattailed, Steatopygous | دووگن ، دوونگن، بەرانێك کە دووگەکەی گەورە بێت . |
| رداغ | Slime, Mud | قوڕ و لیتە . |
| ردب | Diverticulum | توورەکە ، گریّ . |
| ردب ، جيب | Pocket, Sinus | گیرفان، چرچ و لۆچی . |
| ردب | Dead end | درز، درزێك کە کون نەبووبێت . |
| ردب | Blind alley | کۆلانێك کە دەرنەچێت . |
| ردبول ، ريد بول | Redpoll | ( رێدپۆل) ، سەرسوور، چۆلەکەیەکی سەرسوورە. |
| رَدة، نخالة | Barn | کەپەك، کەپەکی ئارد. |
| ردع | | راجع ( زعفران) . |
| ردغة | | راجع ( رداغ) |

| | | |
|---|---|---|
| ردف ، ذنب الدجاجة | Cygni, Deneb | سمت ، كلكی مریشك ، ئەستێرەیەكە . |
| ردف ، كفل | Haunch, Rump, buttocks, Croup, Cruper | سمت، پاشەڵ، پاشڵ، لاقوون، تەرێزە ، كلۆك، سمتەجۆڵە ، كولیمك. |
| ردف مستعار ، عجازة | Bustle | سمتی لاعیە ، سمتی دەستكرد . |
| ردفان | Night and day | شەووڕۆژ. |
| ردفین، احمر الزهانف | Red fin | پەرەكە سوورە ، جۆرە ماسی‌یەكە پەرەكەكەی سوورە . |
| ردم | Filling up with earth | پڕكردنەوە، پڕكردنەوەی زەوی بە گڵ . |
| ردم (أنقاض) | Debris, Rubbish | داروپەردوو . |
| ردن، كم | Sleeve | سەرقۆڵ ، چمك، سەردەست ، چاك ، داوێن ، هوچك . |
| ردن | Wrinkled | چرچ، لۆچ، لوول. |
| ردهة | Hall, Atrium | هۆڵ ، ژوورێكی گەورە، ڕاڕەو . |
| ردهة رئوية | Pulmonary-vesicle | ژوورە سی، سیكلانۆكەسی. |
| ردون، سمنة مفردة | Redwing | باڵ سوورە ، سوورە باڵ جۆرە باڵندەیەكە . |
| ردول، عشبة الدباغین | Coriaria | گیای دەباخ كردن، گیای دەباخی ، دەوەنێكە دەنك و لقەكانی ژەهرن. |
| ردیء | Bad | گەند، گەن، خراو، خراپ، ناپەسەند، پەژموە. |
| ردیف، خلال الاسنان | | دارسیواك، ڕووەكێكە بەرێكی هێشووی هەیە، چیلكەكانی بۆ ددان ئاژنین بەكاردێن. |
| ردیخة | Alternaria | ( ئەلتەرناریا) كەڕوویەكی زیان بەخشە بە ڕووەك. |
| ردینة ، وریقة | Cladode | نیمچە گەڵا، گەڵاكۆكە، پەلكۆكە . |
| ردیوسین | Reducin | ( ریدیۆسین) ، مادەیەكی ئەلكالی‌یە بە شێوەیەكی سروشتی لە شانەكانی لەشی گیانداردا هەیە . |
| رذاذ | Aerosol, Drizzle , Spray | پرووشك ، پرژ، پریشك، پرش، پرژە، ڕشێن، نمە. |
| رذاذ المطر ، مطر خفیف | Thin rain | نمەباران، پرژەی باران، تۆكەی باران، پرووشەی باران. |
| رذرفوردیوم | Ruther fordium | ( رەزەرفۆردیۆم) ، توخمێكی كیمیایی‌یە بریتی‌یە لە توخمی ژمارە (١٠٤) لە خشتەی خولدا نیشانەكەی Rf كێشی گەردی‌یەكەی دەگاتە( ٢٥٧) |
| رذر فورد | Ruther ford | ( رەزەر فۆرد) ١. یەكەی پێوانی تیشك. ٢. ناوی زانایەكە. |
| رذوذ | Powder, Pulvis | تۆز، هاڕراوە. |
| رُز ، تمن | Rice, Oryza | برنج، جۆرێكە لە دانەوێڵە . |
| رزانة | Hypsometry | پێوانی بەرزی ( لەڕووی دەریاوە) . |
| رزاغة، مرطابیة | Hygrometry | پێوانی شێ. |
| رز الدجاج، شبت، شبث | Dill | شـویت ، شـیوت ، شـبیت، گیایـەكی بـۆن خۆشـە بـە شـێوەی بـەهارات بەكاردێت دەكرێتە چێشتەوە . |
| رز مهبش ، رز مقشور | Peeled (Shelled ) rice | برنجی كوتراو ، برنجی كرمكراو . |
| رز مجروش | Crushed-rice, Bruised-rice | برنجی كوتراو، چوار دانگ، چواردانە، چوار دانگە. |
| رز مسلوق، رز دفین | Pilau, Pilaff | پلاو، چەلاو، پەلاڤ . |
| رزاز | | برنج كوت . |
| رز بالحلیب | Rice milk | شیر برنج، جۆرە خواردەمەنی‌یەكە . |

| | | |
|---|---|---|
| رزة | Ringed screw, Screw eye, Staple, Spike, Screw hook | ئەلقە ڕێز ، سورگی، بزماری ئەلقەدار، پارچە ئاسنێکی ئەلقەدارە قوفڵی پیا دەکرێت . |
| رزة وصمولة | | پێچ و مۆرە ، جەر. |
| رزغ | Ooze | قوڕ و لیتە . |
| رزق | Liveli hood | ڕسق ، مایەی ژیان . |
| رزم | Packing | پێچانەوە ، بەستن . |
| رزمة | Packet, Bundle , Bunch | بوخچە ، بەستەك، دەستە . |
| رز مبكر | Early rice | برنجی گەرمەك، گەرمە، زووڕەس ، جۆرە برنجێکە زوو پێ‌دەگات ، دژی برنجی ساردەیە کە ئاوی پایز دەخواتەوە . |
| رزمة كبيرة ، بالة | Bale | فەردە . |
| رزن | To weigh , Assay | خەملاندن ، ڕادەی پاکی مادەیەك یان کانزایەك لە کەرەسە خاوەکەی‌دا. |
| رزنب | | راجع ( زعفران) . |
| رزنة | Marsh | زەلکاو . |
| رزنامة ، روزنامة، تقويم | Calendar | ساڵنامە . |
| رزيانج ، انسيون | Anise | ڕازیانە، ڕزیانك، تۆوەکەی بە بەهارات دادەنرێت. |
| رزيز ، جمال المروج | Rhexia, Meadow-beauty | جوانی مێرگ، ڕوەکێکە ڕەنگی پێ‌دەکرێت گوڵەکەی سوور و زەردە . |
| رزين | Digitaria | ( دیجیتاریا) ، گیایەکی زیان بەخشە لە کۆمەڵەی گەنمە . |
| رزين ، رصين | Sober-minded | مرۆڤێکی ئاغر و سەنگین . |
| رسابة | Deposit, Dregs, Sediment | بەلغ، خڵتە ، نیشتە. |
| رسابة الزيت | Oil dregs | دۆوك، تڵپەی ڕۆن و کەرە . |
| رسابة، غرين | Sediment | قوڕو لیتە ، تڵپە . |
| رسالة | Letter, Message | نامە ، پەیام ، نوسراو ، نامیلکە. |
| رسالة دكتوراه، أطروحة | Thesis | نامەی دوکتۆرا |
| رسالة لاسلكية ، برقية | Radio-telegram | نامەی بێ‌تەل ، بروسکەی بێ‌تەل . |
| رسام | Painter, Draftsman | وێنەگر، نیگارکێش. |
| رسة | | گیایەکە لە ڕووەکی سێوی بن ئەرز دەچێت . |
| رسح، فخج، شلل سفلي | Paraplegia | ئیفلیجی نیوەی خوارەوەی لەش . |
| رسراس، شراس، حلتيت | Asafoetida , Shoe | سرێش، سرێشمە . |
| رسراسي، كمبوجي | Gamboge | ( گەمبۆجی) مادەیەکە لە زەمقی کەمبوجی دروست دەکرێت ، ئەو زەمقەش لە درەختێکی تایبەتی دەردەهێنرێت کە لە نیمچە دوورگەی مەلایۆدا دەڕوێت . |
| رسع | Symble pharon | پێڵوو نووسان ، نووسایی لکێنەی پێڵوو بە لکێنەی گلێنەی چاوەوە، یان نووسانی هەردوو پێڵوی چاو بەیەکەوە . |
| رسغ ، رسغ اليد | Wrist, Curpus | فەرشك ، ئەزەج، مەچەك، زەندا دەستی ، جومگەی نێوان باسك و دەست. |
| رسغ القدم ، حمارة القدم | Tarsus | قولەپێ ، زەنداپێ، بازنداپێ، جومگەی نێوان لاق و پێ . |
| رسغ الدابة | Pastern | مەچەکی وولاخ و ئاژەڵ . |

| | | |
|---|---|---|
| رسف ، شفط | Aspiration | دەرهێنانی ئاو یان گاز لە لەش . |
| رسم | Drawing, Shape | نیگارکردن ، وێنەکردن ، نەخشە کێشان . |
| رسم تخطيطي | Sketch, Diagram | وێنەی هێڵکاریی. |
| رسم بياني | Graph | وێنەی نیشاندەر، وێنەی ڕوون کردنەوە. |
| رسم مجسامي | Stereogram | ( ستێریۆگرام) ، وێنەی تەندار . |
| رسم مائي | Hydro graph | وێنەی ئاویی، وێنەیەکە خێرایی و ڕێڕەوی ئاو پیشان دەدات . |
| رسم بياني خطي | Line graph, Diagron | وێنەی نیشاندەری هێڵی. |
| رسم بياني مناخي ، مصور مناخي | Hythergraph | وێنەیەکی پیشاندەرە بۆ ئەو گۆڕانانەی کە لە دیاردەکانی ئاو و هەوادا ڕوودەدەن |
| رسم ، صورة | Picture, Sketch | وێنە ، نیگار. |
| رسم ، ضريبة | Dues, Tax | باج. |
| رسم كمركي | Custom-duty | ڕەسمی گومرگی ، باج . |
| رسمي | Official | میرکاری ، فەرمانی . |
| رسمة | Rhusma, Depilatory | دارِوو، دەرمانی تووك لابردن . |
| رسن ، لجام | Halter, Bridle | ڕەشمە ، دۆخرشـەمە، هەوسـار ، پـەت، گوریـس، ڕێسـمان ، دەزگـین ، سەرگۆشە . |
| رسو (للسفينة) | Mooring, Landing, Anchoring | لەنگەر گرتن ، وەستانی پاپۆڕ لە قەراغ دەریا . |
| رسو ، ارطي | Yellow-jasmine, Gelsemium | سیرینچکە تاڵە ، یاسەمەنی زەرد ، دەوەنێکە گوڵی جوان دەگرێت . |
| رسوب ، ترسب | Failing, Settling, Sedimentation | نیشتن . |
| رسوبي | Sedimentary | نیشتوویی . |
| رسول الألهة ، عطارد | Mercury | زاوە، ئەستێرەیەکە بەدەوری خۆردا دەسووڕێتەوە. |
| رسوخ ، ثبات | Fixedness, Stability | جێگیرە. |
| رسيدا، بليخة | Reseda, Mignonette | گوڵبەمەنگ، جۆرە ڕووەکێکی بۆن خۆشە گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی سەوزی مەیلە و زەردە . |
| رسيغة | Metatarsus | مەچەکۆکە ، مەچەکی بچووك ، قولەپێی بچووك وەکو لە مێروودا . |
| رش | Sprinkling, Splash | پرژاندن ، ڕشاندن ، پرش کردن . |
| رش الصيد ، خردق | Shot | ساچمە ، ساچمەی تفەنگی ڕاو . |
| رشا ، رشاء | Fawn | بە چکە ئاسك ، کەژاڵ . |
| رشاء | Creeping-stem | قەدی خشۆك . |
| رشاء، الفا الحوت | Alrischa, Piscium | جۆرە ئەستێرەیەکە . |
| رشاد، حرف، قرة العين، ثفاء | Garden cress, Tongue grass | تەرەتیز، تەرەتوورە ، بێزروو، ڕووەکێکە گەڵاکەی پەلکدارە تامەکەی توونە . |
| رشاد بري، حرفرف | Pepper grass, | تەرەتیزە کێویلە |
| رشاد البر، فجيلة | Sea rocket | تووری دەریا ، تووروزکە . |
| رشاد الماء، حرف الماء | Water cress | کووزەڵە ، بێزەروو، گیایەکە گەڵاکەی وەکو سێ پەرەیە لاسکی ئاودار و ئاسك و ئاویی هەیە تامەکەی لە تامی تەرەتیزە دەچێت . |

| | | |
|---|---|---|
| رشاشة | Sprinkler, Sprayer | پرژێنەر ، ئامرازی شلە پرژاندن . |
| رشاش ، رشاشة (للرصاص) | Machine gun | شەستیر ، گوللە پرژێن ، چەكێكی ریزكەرە |
| رشاشة مائية، مطخرة | Watering pot, Watering can | ئاوپرژێن ، ئاوپاش ، پرژێنەری ئاو . |
| رشاشة الروائح العطرية | Scent spray | بۆن پرژێن ، گولاو پرژێن . |
| رشاشة السكر و الدقيق | Dreger | شەكر پژێن ، ئارد پژێن. |
| رشاقة | Grace-slimness | شۆخی ، شەنگی،پێكەوتوویی، لاوچاكی ، رێك و پێكی ، جوانی . |
| رشالة | Hydrocyon | ( رەشال) ، جۆرە ماسی‌یەكی گۆشتخۆری درندەیە . |
| رشاحة ، راشح | Filterate | پاڵێوراو . |
| رشبة | Coconut-endocarp | توێكڵی گوێزی هیندی ، قاوغی گوێزی هیندی |
| رشتة ، رشدة | | رەشتە ، هەرشتە، جۆرەس خواردنێكە لە نیسك و هەویری براوەی نانی تیری نیوە برژاوو جنراو دەكرێتە ناو پلاوو ساوەرەوە . |
| رشح ، ارتشاح | Infiltration, Leakage | دادان، دەلاندن، تاچاندن ( ئاو نەتاچێنیْ) . |
| رشد | Maturity | پێگەیشتوویی، باڵقی . |
| رشد، عقل، صواب | Senses, Mind | ژیری . |
| رشدية، قلنباق، برتقال بامية | Averrhoa, Carambola | پرتەقاڵ بامیْ : درەختێكی گەورەیە بەرەكەی هێلكەیی‌یە، ترشە دەخورێت یان دەكرێت بە مرەبا و شەراب . |
| رشح ، زكام | Exudate, Catarrh, Coryza, Cold inhead, Rheum | هەڵامەت، ئارسم ، پەسیو ، پەرسیف، هاتنە خوارەوەی ئاوێكی لینج لە لووتەوە ، سەر ئێشە و قورگ ئێشە و داهێزرانی لەشی لەگەڵدایە . |
| رشح ، ترشيح | Filtering | پالاوتن . |
| رشح | Suit, Wool grease | ڕۆنی خوری ، ئەو مادە چەورەی كەوا بە خوری مەڕەوە. |
| رشف | Drinking up, To suck | مژینی ئاو بە لچ و لێو ، فڕكردن . |
| رشفة | Drain, Sip, Suck | فڕ، قوم، مڕ، مژ . |
| رشق بالحجر | Throwing stone Toplet with-stone | دانەبەر بەرد ، بەرد پیامالین بەردەباران . |
| رشك، عقرب | Scorpion | دووپشك ، چزەپیاڵە ، كولاژدوم . |
| رشم، رويشة | Plumule | چەكەرە ، چووزی ڕووەك كە سەر لە زەوی‌یەوە دەردەكات . |
| رشم، اثر | Trace | شوێن ، شوێنكار . |
| رشم، ختم | Seal, stamp | مۆر ، دامغە . |
| رشمة الحصان | Ornamented Halter, Bridle | ڕەشمەی وولاخ . |
| رشوة | Bribe | بەرتیل . |
| رشيق | Nice, Elegant-graceful | شۆخ ، شەنگ، قۆز، هەڵكەوتوو. |
| رشيق ( الجسم) | Zippy | خەرامان، قۆز، سوكەڵەی جوان ، زیت . |
| رشيقة ( ابرونية ) | Sand Verbena | ( ئەبرۆنیا) ، میناى لم ، گیایەكە قەدەكەی ریشاڵاوی‌یە . |
| رشيم، جرثومة | Germ | میكرۆب . |
| رشيح، راشح | Filtrate | پالاوتە، ئەو ئاوە ڕوونەی كە بە پالاوتن وە دەست دێت . |
| رص | To arrange, Impaction | رێك خست، یەك خستن . |

| | | |
|---|---|---|
| رصاص | Lead, Plumbago | قورقوشم، سرب، كانزایەكە ژمارەی ئەتۆمی‌یەك ( ٨٢) كێشی ئەتۆمی‌یەكەی (٢٠٧) ڕەنگەكەی خۆڵەمێشی مەیلە و ڕەشە، نیشانەكەی ( Pb) لە دروست كردنی ئامرازی كارەبایی و دارشتەدا بەكاردێت . |
| رصاصي ( لون) | Grey | ڕەنگی قورقوشمی، ڕەنگی خۆڵەمێشی . |
| رصاص احمر، اسرنج | Red lead, lead oxide | ئۆكسیدی قورقوشمی سوور، قورقوشمی سوور، لە دروست كردنی شووشەو پاتری و بۆیەدا بەكاردێت. |
| رصاصية | Plumbago | قورقوشمی، ڕووەكێكە لە ناوچە گەرمەكاندا دەڕوێت گوڵەكەی جوانە . |
| رصاصة البندقية | Bullet, Bulley | فیشەك، گوللە . |
| رصاصية، حشيشة الانسان | Plumbago Leadwort | گیا قورقوشمی، گیایەكی پزیشكی‌یە گوڵەكەی شینی مەیلەو خۆڵەمێشی‌یە . |
| رصاص ازرق | Lead( metal) | قورقوشمی شین، توخمی قورقوشمە، زاراوەیەكە لە پیشەسازی‌دا بەكاردێت بۆ ناونانی قورقوشمی كانزایی بۆ ئەوەی لە بەرهەمەكانی تری قورقوشم وەك قورقوشمی سپی و قورقوشمی سوور، جیابكرێتەوە. |
| رصاص اسود، كرافيت | Graphite | ( گرافیت)، شێوەیەكە لە شێوەكانی كاربۆن ( خەڵوز) قەڵەمی ڕەشی لێدروست دەكرێت. |
| رصاص اسفنجي | Sponge lead | قورقوشمی ئیسفەنجی . |
| رصاص ابيض، (كاربونات الرصاص القاعدية) | White lead, Basic lead-carbonate | قورقوشمی سپی، كاربۆناتی قورقوشمی تفت، سپیاو بۆ ئارایشت . |
| رصاصة طائشة | Straybullet | گوللەی وێڵ . |
| رصد، مراقبة | Watch, Observation | ڕوانین، هووڵ، كاڵبیت . |
| رصد جوي | Meteorological-Observation | كەش شوناسی، وەكو زانینی گەرمی و پاڵەپەستۆ و شێ و باران . |
| رصد فلكي | Astronomical-Observation | تەماشاكردنی تەنە ئاسمانی‌یەكانی وەكو خۆر و مانگ و ئەستێرەكان. |
| رصع، سفاد الطائر | | بەسەردا تسین، جووت گرتنی نێر و مێی باڵندە . |
| رصع، عمي | Brood-comb | گەراو بەچكەی هەنگ لە شانەكەدا . |
| رصع بالجواهر | To set with Jewels | ڕازاندنەوە بە گەوهەر . |
| رصع، بثق | Asphyxia | بە ئاو كەوتن، نەخۆشی‌یەكی ڕووەكی‌یە لە ئەنجامی زۆر ئاودانەوە هەناسەی ڕووەك سست دەبێت. |
| رصفة | Dimple | چاڵ . |
| رصف، رصف بالحجارة | Paving, Macadamising | بەرد ڕێژ، خشت ڕێژ، ووشكە سی، سەنگ چن، ووشكە چن، ووشكە كەڵەك، بریتی‌یە لە دانانی بەرد لە حەوشەدا یان دیوارێك بەبێ قوڕ و گەچ و قسڵ و چیمەنتۆ دروست كرابێت . |
| رصيد ( في الاقتصاد)، رصيد الحساب | Balance | پوختەی دارایی ( پارە)، پشتیوانە، پاشماوەی ژمێریاری، پاشماوەی پارە. |
| رصيد، إئتمان | Credit | پشتیوانە، پشتیوانەی ( پارەی) كەسێك لە بانقدا. |
| رصيد البضائع | Stock on hand | پشتیوانەی كەل و پەل |
| رصيص، مرصوص | Compressed, Compact | پەستێوراوو كوتراو . |
| رصيص | Conglomerate | بەردێكی چن چینی نیشتوو لە چەو بەرد پێك هاتووە. |
| رصيعة | Medalion | مەدالیا . |

| | | |
|---|---|---|
| رصيف البحر، كورنيش | Corniche | ( كۆرنيش)، شۆستەی دەريا يان ڕووبار . |
| رصيف ( للشارع) | Pravement, Foot way, Side walk | پيادەڕۆ، شۆسە، شۆستە، کەنارەڕێ. |
| رصيف القطار | Plat form | شۆستەی شەمەندەفەر، ئەو شۆستەیەی کە شەمەندەفەری لە تەنیشتەوە دەوەستێت . |
| رصيف السفن، رصيف الميناء | Landing pier Quay, Wharf | شۆستەی بەندەر، شۆستەی پاپۆر، شۆستەیەکە لە قەراغی دەرياکاندا کەشتی لە تەنیشتەوە دەوەستێت . |
| رصيف الامواج، مرطم | Mole | شۆستيە شەپۆل لە کەناری دەريادا . |
| رصين، ثابت، حازم | Calm, Staid, Sedate | جێگير، قايم، مەحکەم . |
| رصين، حبيك | Compact | سفت . |
| رصين، هبار، قرد مقدس | Solemn Ape | مەيمونی پيرۆز،جۆرە مەيمونێکی پيرۆزە لە لای هەندێك ميللەت . |
| رض، كدمة | Bruise | ڕووشان، ڕووشاوی، کوتان، کوتراوی، خوێن ، تێزان . |
| رض، كلم، جرح | Trauma, Contusion | بين، برينداری، خوێن تێزان، قرنجان، کوتراوی. |
| رُضاب | Saliva | ( ١ ) ليك، تف، بۆراك، کەف . |
| رُضاب | Snow Flakes | ( ٢ ) کلۆی بەفر يان تەرزە . |
| رِضاعة، ارضاع | Sucking, Suckling | شير خورادن، مەمك خواردن . |
| رضاعة، زجاجة الارضاع الاصطناعي | Feeding bottle, | مەمکی دەستکرد، مەميە، مەمکەشووشە . |
| رضاعة البقر، ام الحيات | Eumeces | بزن مـژە، بـزن مشـك، دايكـە مارانـە، جـۆرە مارمێلکەيـەکی گەورەيـە ڕەنگەکەی زەردە . |
| رضع | Sucking, Lactation | شيرخواردن . |
| رضراض، زلط | Pebbles | چەو، ووردە بەرد . |
| رضفة، داغصة، صابونة الركبة | Knee cap, Patella, Knee-pan, Trochanter | کەشکە ئەژنۆ، کلاوەی ئەژنۆ، کاب، ئێسقانێکی خڕی پـانی جوولاوەيـە لەسەری ئەژنۆدا . |
| رضفي | Patellar | شتێك پەيوەندی هەبێت بە کلاوەی ئەژنۆوە . |
| رضم | Blocage | ناوکار، ناوکاری نێوانی دوو لای ديوار . |
| رضوخ، اذعان | Yielding | سەر شۆڕکردن،سەردانەواندن، مل کەچی. |
| رضوض | Bruise | کوتراوی، کوتراوی لە پێست و ئێسکدا . |
| رضيض، مرضوض | Bruised | کوتراو، ئەندامێکی کوتراو، هەڕشيی . |
| رضيع | Infant, Baby, Suckling, Nursling | شيرە خۆرە، بەرمەمکانە ، شيرمژ، ساڤا، ساوا، کۆرپە، بەبلە . |
| رطام، إمساك | Constipation | گرفت، گيران، گيری، سك دەرنەچوون . |
| رطب | Soft ripe-dates, Mature dates | خورمای تەڕ، فەريکە خورما، خورمای فەريك . |
| رطب | Damp, Humid, Moist | شێدار، تەڕ، هێوی . |
| رطبة، فصة، نفل المروج، فصفصة، قضب | Lucern, Alfalfa, Medicago | سێپەرە، وێنجە، جۆرە گيايەکە گەلاکەی سێ‌پەلکە گۆڵەکەی بنەوشەيی‌يە بە پيتە، دەشێ سالی هەشت جار بدوورێتەوە بۆ لەوەڕ باشە . |
| رطريط، عجرم، بلبال، طرطير | Salsola-articulata, Haloxylon | زيرەی کرمانی، ڕووەکێکی بيابانی‌يە گەلاکەی ئاووکدارە گوڵەکەی سپی يان زەردە دەرمانی لێ‌دەردەهێنرێت . |
| رطانية، رطنية، رطن | Rhatany, Ratanhia | ( راتانی)، جۆرە گيايەکی پزيشکی‌يە . |

| | | |
|---|---|---|
| ريح خفيفة | Soft blowing-wind | كزه با، شنه. |
| ريح الخماسين | Khamasin | بایەکی ناوچەیی زۆر گەرمی ووشکە لەبیابانی میسردا هەڵ دەکات. |
| ريحي، هوائي | Aeolian | بایی، هەوایی. |
| ريحان شامي، اس | Myrtle | مۆرد، مۆرت، دەوەنێکی بۆن خۆشە بۆ ڕازاندنەوە دەڕوێنرێت. |
| ريحان ابيض، شيبة، افسنتين، خثرف، دقن الشخ، شيح رومي | Absinthe, Worm wood tree | (ئەفسەنتین)، دەوەنێکە گوڵەکەی شۆڕدەبێتەوە بۆ سەرزەوی. |
| ريحان حلو، حبق | Sweet basil | ڕێحانە شیرنە، فرمنجی مشك، گیایەکی بۆن خۆشە بەشێوەی بەهارات بەکاردێت. |
| ريحان | Basil, Sweet basil | ژیون، ڕێحانە، ریۆن، ئەسپەرەم گیایەکی هاوینەی بۆن خۆشە، گوڵەکەی سپی‌یە لەگەڵ خواردەمەنیدا بەکاردێت. |
| ريحان ابيض | Artemisia araborescens | ریحانەی سپی، ئەرتمیزیای درەخت ڕووەکێکی بۆن خۆشە. |
| ريحان الارض | Dittamy of crete | پاقلەی ئاسك، ڕێحانەی زەوی، بۆمەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| ريحان جبلي، ريحان بري | Wild basil, Organcy, Common marjoram | چەدەنە، برنج مشك، ڕێحانە کێویلە، گیایەکە گوڵەکەی سپی مەیلەو سوورو بۆن خۆشە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| ريدة، نسيم | Light breeze | شنەی با، جۆرە بایەکە گەڵای درەخت دەلەرێنێتەوە خێرایی‌یەکەی (٧,٢)کم لە سەعاتێکدا. |
| ريدبون، ردبون | Redbone | (ڕێدبۆن)، ئێسکەسوور، سەگێکی ڕەنگ سووری مەیلەو قاوەیی‌یە. |
| ريديا | Redia | (ریدیا)، قۆناغێکە لە قۆناغەکانی گەورەبوونی کرمە پانەکان. |
| ريدروت | Redroot | (ڕێدرووت)، ڕەگە سورە، سوورە ڕەگ، ڕووەکێکە گەڵاکەی لەشێوەی تیردایە گوڵەکەی کوڵکنە ڕەگەکەی سوورە. |
| ريدوب، مرجية بيضاء، نجيل ابيض | Redtop | مێرگەسپی، جۆرە گیایەکە. |
| ريدفين، ردفين | Redfin | (ڕێدفین)، پەرەکە سوورە، جۆرە ماسی‌یەکە. |
| ريزومة، جذمور | Rhizome | (ڕایزۆم)، قەدی ژێرزەوی، لقی درەختێکە کە لەژێرزەوی‌یەوە تووڵ کێش کرابێت بۆ ئەوەی کە بنجێکی تری لێ سەوزبێت، قەدی ڕووەك کە لە ژێر زەوی‌دا دەبێت و لە ڕەگ دەچێت. |
| ريزوميس، فأر البوص | Rhizomys | (ڕایزۆمیس)، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە مشکە کوێرە دەچێت. |
| ريزوفلافين | Resoflavin | (ریزۆفلاڤین) بۆیەیەکی زەردە لە ریزۆرسین دەردەهێنرێت. |
| ريزوبال | Resopal | (ریزۆپال) ڕێسینێکی دەستکردە لە دروست کردنی گۆڕەری کارەباییدا بەکاردێت. |
| ريزوبودا، جذرية القدم | Rhizopoda | پێ ڕەگی‌یەکان، بەشێکە لە گیاندارە سەرەتای‌یەکان وەکو ئەمیبا. |
| ريزورسين | Resorcin | (ریزۆرسین)، ئاوێتەیەکی ئەندامی فینۆڵی‌یە، دەرمانێکە دژی بۆگەن بوون بەکاردێت. |
| ريزونانس، رنين | Resonance | ١. (ریزۆنانس) دەنگ دانەوە.<br>٢. دیاردەی بەردەوام گۆڕینەوەی جێگای بەندە تاك و جووتەکان لە گەردی ناتێری وەکوو بەنزیندا. |
| ريسول | Resol | (ریسۆل)، دەرمانێکی پاکژکەرەوەیە لە قەتران و سابوونی پۆتاس دروست دەکرێت. |
| ريسين | Ricin | (ریسین)، مادەیەکی پرۆتینی ژەهرە لەتۆوی گەرچەك دەردەهێنرێت. |
| ريش، ريشة | Feather, Pluma, Plume, Quill | پەڕ، کۆنك. |

| | | |
|---|---|---|
| ريش الوز | | تووكى قوو. |
| ريشة المروحة | Vane | پەرەكەى پانكە، پەرەى پانكە. |
| ريش القوادم، ريش أولى | Remex | شاپەر، سەربال، شابال. |
| ريش الجناح | Remiges | پەرى بالى بالندە. |
| ريشة المصور | | فلچەى وێنەكێشان. |
| ريشة القلم | Pen nib | نووكى قەلەم، نووكى پێ نووسين. |
| ريش الذيل، ذنب الطير | Rectrices | پەرى كلك، كلكى بالندە، ئەو پەڕانەى كە بەكلكى بالندەوەن. |
| ريش الطيران | Remiges, Oar feathers | پەرى فڕين. |
| ريشة العزف | Plectrum | ئەو پەرەى كە ئامرازى مۆسيقاى پێ لێ دەدرێت. |
| ريشي | Pinnate, feathery | پەريى، شتێك پەيوەندى بە پەرەوە هەبێت. |
| ريشارديا، كالا | Calla | (ريشارديا)، (كالا)، پيازێكى هاوينەيە گوڵى جوان دەگرێت گەڵاكەى سپىيە. |
| ريص | Rhesus | (ريسەس)، مەيموونێكى هيندى بچووكى كلك كورتە. |
| ريعان | Prime | تاف، هەرەتى گەنجى. |
| ريع، غلة | Produce, product | بەروبووم، بەرهەم، قازانج. |
| ريع الاراضي الزراعية | Esplees | بەروبومى كشتوكاڵ، خەلە. |
| ريف | The country | لادێ، هەرێم، گوند، ئاوايى، دێ. |
| ريفي | Rustic | لادێى. |
| ريفينة | | گياى دارتاش، دەوەنێكە گوڵى بچووكى سپى دەگرێت بەرەكە سوورە. |
| ريفيدا، نياب الحية | Snake-flies | مێشەمارانە، جۆرە مێشێكە. |
| ريق، رضاب، لعاب | Saliva, spittle | تف، ليك، بۆراك. |
| ريكتوريت | Rectorite | (رێكتۆريت) كەرەسەيەكى خاوى سپىيە لە سليكاتى ئەلە منيۆم پێكهاتووە. |
| ريكتيفاير، معدلة كهربائية، مقوم التيار | Rectifier | (رێكتيفايەر)، ئەو ئامرازەيە كە لێشاوى كارەبايى ئەى. سى (A.C) دەگۆرێ بۆ (D.C) دى. سى. |
| ريكتسيا | Rickettsia | (رێكتسيا)، كۆمەڵە زيندەوەرێكە لە نێوانى ڤيرۆس و باكتريادا بەهۆى مێروەوە بڵاو دەبنەوە بۆ مرۆڤ و دەبنە هۆى نەخۆشى. |
| ريكي | Ricky | (ريكى)، جۆرێكە لە مەى ئاوى ليمۆى ترش و شەكرى تيايە. |
| ريل | Gazelle | ئاسك، مامز، شەمكۆر، بانيز، ئاهوو، جەيران. |
| ريلجار | Realgar | راجع (رهج الغار). |
| ريم | White gazelle, Addax | ئاسكى سپى. |
| ريمة، طفاوة القدر | Scum, Dross | كەفى مەنجەل. كەفى چێشت. |
| ريماز | Termite, White ant | تەختەكالۆس، ليومگ، مێرووڵەى سپى، قەرەونە، مێروويەكە لەسەر تەختە دەژى. |
| رينين | Renin | (رينين)، خۆلاسەى گورچيلە، پرۆتينێكە لە گورچيلەدا دەبێتە هۆى كرژبوونى بۆريەكانى خوێن و ميزەردان. |
| رينيوم | Rhenium | (رينيۆم)، توخمێكى كانزايە كێشى ئەتۆمىيەكەى (١٨٦) و ژمارەى ئەتۆمىيەكەى (٧٥)ە، كانزايەكى خۆڵەمێشىيە ئەگەر بەشێوەى تۆزبێت و، سپى مەيلەو زيوييىيە ئەگەر رەق بێت، ناوەكەى لە ووشەى (راين) لە فەرەنسەوە وەرگيراوە (رينيۆم). نيشانەكەى (Re)ە لە دروست كردنى دارشتەو ئامرازى گەرمى و كارەباو سارووخدا بەكاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| رنيوبومة | Rhinopoma | (رينۆپۆما)، جۆرێكە لە شەمشەمە كوێرە لووتی سێ گۆشەیی‌یە. |
| ريوسكوب | Rheoscope | (ريسكۆپ)، دووربینی تەوژمی كارەبا. |
| ريوق، ترويقة | Breakfast | ناشتا، بەرقلیان، بەرچایی. |
| ريوستات | Rheostat | (ڕیۆستات)، ئامرازی بەرهەڵستی‌ی كارەبای گۆڕاو. |
| ريو توم، مَقطع التيار | Rheotome | (ریۆتۆم)، ئامرازی كردنەوەو داخستنی تەوژمی كارەبایی. |
| ريولوجيا | Rheology | (ریۆلۆجی)، زانیاری تەوژم، تەوژمی كارەبا یان خوێن. |
| ريوترون | Rheotron | (ریۆترۆن)، ئامرازی خێراكەری ئەلیكترۆنەكان. |
| ريهقان، زعفران | Saffron | زەعفەران: ڕووەكێكی پیازیی‌یە گوڵەكەی زەردی مەیلەو سوورە بۆ مەبەستی ڕەنگ كردن و پزیشكی بەكاردێت. |
| ريوليت | Rhyolite | (ریۆلیت)، بەردێكی گرشكانی‌یە لە گرانێت دەچێت كوارتزو فیلسپاری تێدایە. |
| ريومور، رومير، رومر | Reaumur | (ریۆمۆر)، پێوانەیەكە بۆ پلەی گەرمی لە ئەڵمانیا بەكاردێت. لێرەدا پلەی سفر بریتی‌یە لەبەستنی ئاوو پلەی (٨٠ ْ) كوڵانی ئاو. |
| ريو متر | Rheometer | (ڕیومیتەر)، دەزگایەكە بۆ پێوان یان ڕێكخستنی تەوژمی كارەبایی یان خوێن. |

| | | |
|---|---|---|
| زئر - زئير - زمجرة | Roaring = Bellowing | زیرە، نەڕاندن، نەڕەی شێر، نەرە، دەنگی شێر. |
| زئر - زئر نساء - زير النساء | Gallant = Ladies-man | مێ باز. |
| زئبرة | Nap = Pile = Down | خاو، ریشووی قوماش. |
| زئبر - زغب | Nap | گەنگەموو. |
| زئبـــق = زاووق - زيبق - فرار | Mercury = quick-silver | (هایدرۆنـەرجیرۆم) ، مێرکـەری، جیـوە، توخمێکـە کێشـی ئەتۆمیەکـەی (٢٠٠,٥٩) ژمارەی ئەتۆمیەکەی (٨٠)یە کانزایەکی شلەیە ڕەنگی سپی زیویە، ماناکەی زیوی شل دەگرێتەوە لە پڕکردنی تەرمۆمەتر بۆ مەبەستی پزیشکی و گەرمی پێو بەکاردێت. نیشانەکەی ( Hg). |
| زئبق حلو - كالومل | Calomel | (کالۆمل)، میرکرۆز کلۆراید، بەشێوەی مادەی پاکژکەرەوەو ڕەوان کەرو لە کاروباری فۆتۆگرافیدا بەکاردێت. |
| زئم - عين بسيطة | Insects eys ocellus | چاوی مێرو ئەگەر سادەبێت. |
| زائد - فائض | Super abundant | زۆر، زیادە، پڕ. |
| زائد = (+) | Plus | نیشانەی زائید، نیشانەی موجەب لە بیرکاریدا . |
| زائدة | Appendix | هەرئەندامێکی زیادە لە لەشی گیاندارو ڕووەکدا. |
| زائدة اصبعية | Dacty late | زیادە گۆشتی پەنجە. |
| زائدة = لاحقة | Appendage | چوکڵە، نۆکە، درێژبونەوەیەك لە لەشی مرۆڤ یان گیانداردا وەك باڵ و قاچ و قۆڵ یان قۆچی هەستیاری. |
| زائدة دودياً | Vermiform- appendix | پەلە ڕیخۆڵە، ریڤیا درێژ، ڕیخۆڵە کوێرە، زیادە گۆشتێکە نوساوە بەلای چەپی ڕیخۆڵەئەستورەوە هیچ فرمانێکی نیەو درێژیەکەی ٧-١٠سم دەبێت هەندێك جار توشی سوتانەوە دەبێت. |
| زائدة لمسية | Barbel | سمێڵ، چوکڵەی هەست، وەکو لەم لاو لەولاوی دەمی ماسیدا. |
| زائدة انفية | Adenoids | زیادە گۆشتی یان دومەڵی ناو لوت. |
| زائدة جلدية | Wart | زیادە گۆشت لە پێستدا. |
| زائدة شرجية | Analcerci | چوکڵەی کۆمی. زیادە گۆشتی کۆم. |
| زائغ - منحرف | Deviating = Aberrant | لادار. |
| زائف - كاذب | Pseudo = Simulated = Spurious | قەڵب، درۆزنە. |
| زائر | Visitor = Guest | میوان. |
| زاب - رافد | Branch = Tribulary | زێ، چۆم، چەم. |
| زاج | Vitriol = sulphate | زاج، گۆگردات- سولفەیت- زاخ. |
| زاج الكوبلت | Cobalt vitriol | زاخی کۆباڵت، بریتیە لە گۆگرداتی کۆباڵت. |
| زاج قبرصي - كبريتات الحديدوز المائية | Cyprian-vitriol | زاخی قوبروسی، گۆگرداتی ئاسنی ئاویی. |
| زاج اخضر = قلقدون - قلقند | Green-vitriol = Ferrous-Sulphate = copperas | قیژاڵکە، زاجی سەوز، مردارسەنگ، زاخی سەوز، گۆگرداتی ئاسنۆز. |
| زاج ازرق | Blue-vitriol = Cupric-sulphate = Blue stone | زاجی شین، قاژقاژە، ژەنگار، مۆروە شینە، گۆگرداتی مس. |
| زاج أسود | Black-vitriol | قڵیاو، سیازاج، زاخی ڕەشی، زاج کە بۆ ڕەش کردنی پێستی دەباخ کراو بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| زاج احمر | Red vitriol = Colcothar | زاجی سور، ئۆکسیدی ئاسنی سوری سروشتی. |
| زاج ابيض - كبريتات الخارصين | Whte vitriol = Zinc sulphate | زاجی سپی، گۆگرداتی توتیا، گۆگرداتی زینك. |
| زاحف - زحاف | Reptlie | خشۆك، خشندە، وەكو مارو مارمێلكەو كیسەڵ. |
| زاحف مجنح - زاحف طائر | Pterodactyl = Pterosaur | (پتـــیرۆداكتیل)، خشـــۆكی بـــاڵدار، گیـــاندارێكی خشـــۆكی بـــاڵداری قرتێكەوتووە. |
| زاحفة بوقية | Trumpet-vine Trumpet creeper | خشۆكە زوڕنایی، ڕووەكێكی كەپریی و بەهێزە گوڵەكەی لە زوڕنا دەچێت لەلای دیوارەوە دەڕوێنرێت خۆی پێوە دەنووسێنێت و دای دەپۆشێت. |
| زاحف - متسلق | Creeping = Trailing | خۆهەڵواسەر، هەڵچوو (بۆ ڕووەك). |
| زاد - مؤنة | Provisions | ئازوقە، خۆراك، زادتۆنە. |
| زاد المسافر | Traveler-provision | توێشو، ئەو خواردەمەنییەی كە گەشتكەر لەگەڵ خۆی دەیبات. |
| زارة | Jungle | بێشەڵان، ئەیزار. |
| زارع - مزارع | Sower = Farmer = Planter | كشتكار، كشتیار، تۆوچێن، وەرزێر، جوتیار. |
| زارع الرز | Rice farmer | گۆخڵ، جوتیاری مەرەزە. |
| زارة = برغش الخيل = شعران | Hippobosca | مێشەسەگانە، مێشەكەرانە، مێشی ئەسپ. |
| زاغ = غراب الزرع = قـاق - غراب الزيتون | Jack-dow = Rook = Hoodie | قەلەڕەش، قەلەبەلـەك، قـژاك، قـاژ، ئەگـەت، بەدفەڕ، قژاڵكـە، قـاژو، قـاڵاو، خوڵەرون، قاڵاو بۆلینە، جۆرێكە لە قەلەڕەشكە دەنوك و قاچی سورە. |
| زاغ الجيف | Carrion-crow | قەلەڕەشكەی لاشەخۆر. |
| زالقة | Glider | فڕۆكەی بایەوان. |
| زالخة - اطوم، ناقة البحر - جمل البحر - عروسة البحر | Dugong Halicore | بوكی دەریا، وشتری دەریا، جۆرە گیاندارێكە لە ئەهەنگ دەچێت گیاخۆرە لە دەریادا دەژی. |
| زام | To growl | زریكاندنی پڵنگ. |
| زامر - زامور | Pilot fish | ماسییەكە ڕابەرە: ماسیەكی دەریای پیرۆزە. |
| زامرة = نبات فلفلي | Marsilea | ڕوەكێكی بیبەرییە لە زەلكاوەكاندا دەڕوێت. |
| زاميا - زامية | Zamia | (زامیا)، جۆرێكە لە درەختی سایكاس درەختێكی كورتی ئەستورە لقی نیە سەرەكەی كۆمەڵێك گەڵای پێوەیە لە ناوچە گەرمەكان دەڕوێت بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە بەكاردێت. |
| زامية الكفر، شجرة الخبز | Jamaica-sago free | دارنان، جۆرێكە لە درەختی زامیا ئاردی لێدەردەهێنرێت. |
| زان - مران - سقوم | Beech = Fagus | ئارەوەن، بناو، بناف، ڕەشەدار، درەختی زان، وزم، سورەچنار درەختێكی جوانە لە بەرو دەچێت زۆر بەرز و ئەستور دەبێت توێكڵی قەدەكەی ساف و خۆڵەمێشیە گەڵاكـەی هێلكـەی و سـەوزە لـە بـەهارو پـایزدا مەیلـەو سـور دەبێت بەرەكەی لە فنق دەچێت بەشێوەی دوانەیە توێكڵێكی ڕەقی دڕكاوی پێوەیە، بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە بەكاردێت. |
| زانثيات | Xanthate | (زانثات)، خوێی ترشی زانثیك. |
| زانثين | Xanthein = xanthin | (زانثـین) ئـەو مـادە زەردەی كـە لـە ڕوەكـدا هەیـە وەكـو لـە گوڵەبـەڕۆژەو ڕۆنیاسدا. |
| زانثاين | Xanthine | (زانثاین)، ئاوێتەیەكی نایترۆجینی كریستاڵییە لە میزو خوێندا هەیە. |
| زانثوفيل - يصفور | Xanthophyll = Leaf yellow | (زانثوفیل)، ڕەنگێكی ڕووەكی زەردە لە تۆو گەڵای هەندێك ڕوەكدا دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| زاهي (زاه) | Florid = Bright = Gay = Blooming | بریسکەدار، ڕەنگاو ڕەنگ، ڕەنگین، ئاڵو والآ، بریقەدار. |
| زاهي أخضر - لامع أخضر | Brilliant- green | سەوزی بریسکەدار، دەرمانێکە بۆ چارەکردنی کێم و جەراحەت. |
| زاهي أصفر - لامع أصفر | Brilliant- yellow | زەردی بریسکەدار، مادەیەکە بە شێوەی ئاسەرەوەی کیمیایی بەکاردێت. |
| زاوية، ركن | Corner | کاژێر، گۆشە. قوژنە. |
| زاوية | Angle | گۆشە، ئەو شێوەیەی کە لە بەیەکگەیشتنی دوو هێڵی ڕاست یان دوو تیشك کە لەیەك خاڵەوە بکێشرێن پەیدا دەبێت. |
| زاوية | Corner | گۆشە، کوژی، سوچ، قوژبن، گونج، کونج، سیلە، لك، قولینچك، قورچ، قورنە. |
| زاوية الارتفاع | Angle of elevation | گۆشەی بەرزی. |
| زاوية السقوط | Angle of incidence | گۆشەی داکەوتو، گۆشەی کەوتن. |
| زاوية الانعكاس | Angle of reflection | گۆشەی ڕەت بونەوە. |
| زاوية الانكسار | Angle of refraction | گۆشەی شکانەوە. |
| زاوية القذف | Prodection angle | گۆشەی هاویشتن. |
| زاوية الدوران | Circulation angle | گۆشەی سوڕانەوە. گۆشەی خولانەوە. |
| زاوية الانخفاض | Depression angle | گۆشەی نزم بونەوە، گۆشەی داکەوتن. |
| زاوية الاستقطاب | Polarization angle | گۆشەی جەمسەرگرتن، گۆشەی پۆل گرتن |
| زاوية ساعية | Hour angle | گۆشەی کاژمێری. |
| زاويــة النجــار - النحات - كوس | Square = Set square | گۆشەی دارتاش، ئەو ئامرازە گۆشەیەی کە دارتاش بەکاری دەهێنێت. |
| زاوية متتامة | Complementory angle | گۆشەی تەواوکەر، یەکێك لەو دو گۆشەیەی کە کۆی هەردوکیان دەکاتە گۆشەیەکی وەستاو ٩٠ پلە. |
| زاوية متوالية | Progressive- angle | گۆشەی دوابەدوا. |
| زاوية متناظرة | Corresponding angle | گۆشەی هاوتا. |
| زاوية حرجة | Critical angle | گۆشەی شلۆق، گۆشەی لەنگێز. |
| زاوية مستقيمة | Straight angle | گۆشەی ڕاست واتە ١٨٠ پلە. |
| زاوية الانحراف | Angle of deviation | گۆشەی لادان. |
| زاوية زوجية | Dilhedral- angle | گۆشەی جوت. |
| زاوية مائلة | Oblique angle | گۆشەی لار. |
| زاوية الميل | Angle of Inclination | گۆشەی لاری. |
| زاوية خارجية | Exterior angle | گۆشەی دەرەوە، گۆشەی دەرەکی. |
| زاوية داخلية | Interior angle | گۆشەی ناوەوە، گۆشەی ناوەکی. |
| زاوية متقابلة | Vertical angle<br>Opposite angle | گۆشەی بەرامبەریەك، گۆشەی هەمبەر. |
| زاوية الطور | Angle of phase | گۆشەی تەرز، گۆشەی بار. |
| زاوية قائمة | Right angle | گۆشەی وەستاو واتە ٩٠ پلە. |
| زاوية البلورة | Crystal angle | گۆشەی کریستال - گۆشەی بلوور. |
| زاوية محصورة | Included angle | گۆشەی دەورەدراو، گۆشەی ئابڵوقەدراو. |

| | | |
|---|---|---|
| زاوية مجسمة | Solid angle | گۆشەی تەندار، گۆشەی بەقەوارە، گۆشەی بەرجەستە. |
| زاوية مكملة | Suppl ement ary angle | گۆشەی تەواوکەر. |
| زاوية منفرجة | Obtuse angle | گۆشەی کراوە، ئەو گۆشەیەیە کە لە ٩٠ پلە زیاتر و لە ١٨٠ پلە کەمتربێت. |
| زاوية حادة | Acute angle = Sharp angle | گۆشەی تیژ، لە ٩٠ پلە کەمتر بێت. |
| زاوية الميل المغناطيسي | Magnetic declination | گۆشەی لاریی موقناتیسی، ئەو گۆشەیەی (بۆشاییەی) کە دەکەوێتە نێوانی خاڵی (نقطـة) باکووری موقناتیسی و باکووری جوگرافییەوە بەمەرجێك سەری گۆشەکە لە هەر خاڵێك بێت لە سەر ڕووی زەوی. |
| زاوية متبادلة | Alternate- angle | گۆشەی ئاڵ و گۆڕکراو. |
| زاوية متجاورة | Adjacent- angle | گۆشەی هاوسێ. |
| زاوية الاحتكاك | Angle of friction | گۆشەی لێك خستن، گۆشەی لێك کەوتن. |
| زاوية الانزلاق | Angle of slip | گۆشەی خلیسکان. |
| زاوية محيطية | Circumfere-tial Angle | گۆشەی چێوەی. |
| زاوية الابصار | Visual Angle | گۆشەی بینین. |
| زاوية مركزية | Central Angle | گۆشەی چەقی، گۆشەی ناوەڕاست. |
| زاوية معكوسة | Reflex Angle | گۆشەی پێچەوانە، گۆشەیەك لە ١٨٠ پلە زیاتر و لە ٣٦٠ پلە کەمتر بێ. |
| زاوية التماس | Angle of contact | گۆشەی بەرکەوتن. |
| زاوية الحيود | Diffraction Angle | گۆشەی لادان. |
| زاووق - زئبق | Mercury | جیوە، کانزایەکی شلە. |
| زاورة - حوصلة | Crop = craw | سیکڵدانە، جیکڵدانە، جیقڵدانە. |
| زاي - صواي = مرعة | Widgeon | جۆرە مراویەکە. |
| زايكوت = لاقحة | Zygote | (زایگۆت)، هێلکەیەك یان خانەیەکی بەپیتکراو. |
| زايكوت متحرك | Zygozoospore | زایگۆتی جوڵاوە. |
| زايلول - زيلول - زيلين | Xylol = xylene | (زایلین)، (زایلۆل)، (زیلۆل)، ناوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنی پەرشەوەبوە، لە پەترۆل دەچێت لە قەترانی خەڵوز دەردەهێنرێت بۆ ڕەنگ کردن بەکاردێت. |
| زايمير | Zymase | (زایمێز)، هەوێنێکە (ئەنزیمێکە) شەکری گلوکۆز دەکات بە ئەلکهول. |
| زاينب | Zineb | (زاینیب)، تۆزێکە بۆ لەناوبردنی کەڕوو و مێرووی زیانبەخش بەکاردەهێنرێت یەکێکە لە ناوێتەکانی زینگ. |
| زايمولوجيا = علم الخمائر | Zymology | (زایمۆلۆجی)، زانستی هەوێنەکان، ئەو زانستییەی کە باسی ترشان و هەوێنەکان دەکات. |
| زب - اير - قضيب | Mutinus = Penis = Pullus | چووك- کێر. |
| زب الارض - طرثوث | Maltase- mushroom | چووکی زەوی، کێری زەوی، جۆرە قارچکێکە. |
| زبـاب - زبابـة - جرذ الملك | Shrew = Shrew mouse Dor- mouse, sorex | شیرناڵی، مشکی دارودرەخت، گیاندارێکە لە مشك دەچێت لەلای کۆمیەوە -تورەکە- یەکی هەیە ماددەی بۆنخۆشی تێدایە مێرولەو مێش و مەگەز و کرم دەخوات. |
| زباد | Buttery | کەراوی، هەر شتێك کەرەی لێ دەربهێنرێت. |
| زباد = زبادة - قط الزباد - سنور الزباد | Civet-cat = Musk-cat | پشیلەی مسك، گیاندارێکی گۆشتخۆرە لە پشیلە دەچێت لە ژێر کۆمی دا تورەکەیەك هەیە ماددەیەکی بۆن خۆشی تێدایە پێی دەوترێت (زەباد) بۆ دروستکردنی عەتر بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| زباد الهند | Zibet = Zibeth | پشیلەی مسکی هیندی. |
| زباد = زهم | Civet = Zibet | (سیڤیت) زەباد، ماددەیەکی بۆن خۆشە وەکو مسك لە تورەکە یەك لە ناوگەلی پشیلەی (سیڤیت) دەردەهێنرێت. |
| زبادة = آذان = الصخلة = لسان الحمل | Plantain | گوی بەرخە، سیرێش، جافلقینە، گیایەکە گوڵەکەی زەردەو تۆوەکەی ڕەشە. |
| زبادي = حشيشة النجم | Star wort | گیائەستێرە، گیایەکی کێوی پزیشکیە گوڵەکەی بۆن خۆشە. |
| زبادي = لبن | Curdled milk | ماست. |
| زبارة = فلقة | Cotyledon | لەتکە، لەتکەی تۆوی ڕووەك وەکو لەتکەی پاقلە . |
| زبارة = تقليم الكروم | Grape pruning vine-dressing | مێوبڕین، هەڵپاچینی درەختی مێو بۆ گەشەکردنی . |
| زباطة | Duck | مراوی. |
| زبال =كناس | Dust man = scavenger | خۆڵکێش، کەنناس. |
| زبالة = كناسة | Sweepings | زبڵ. |
| زبان = زباني | Antenna | قۆچی هەست لە مێرودا. |
| زباني = حمة = شوكة | Sting | چزو، وەکو چزوی دوپشك. |
| زبانة العقرب | Librae | چزوی دوپشك، ئەستێرەیەکە. |
| زبانة = مبسم السيكارة | Cigarette = Holder | دار جگەرە، قەندە، دەم جگەرە. |
| زبانة = فارة الحصاد | Dwarf mouse = Harvest mouse | مشکی دەرەو یان خەرمان، مشکی بچوك. |
| زبب | Pappus | کورك، توکی گوێچکە، گەندە موی ڕومەت و چەناگە، گەندە موی دەموچاو. |
| زبد = رغوة = غثاء = طفاوة | Scum, Foam , Froth | کەف، کەفی لالفاوە. |
| زبد = زبدة = نهدة = الوقة | Butter | کەرە، فەریکەڕۆن، ڕۆنەکەرە، نونشك، نڤیشك، ژەمەن. |
| زبدة صناعية | Oleomargarine = Butterine | (ئۆلیۆمارگارین)، کەرەی دەستکرد. |
| زبدين = زيت الزبدة | Butter fat = butterin | ڕۆنی کەرە، ئەو ڕۆنەی لە کەرەدا هەیە. |
| زبدة القمر | Selenite | (سیلینیت) کەرەی مانگ، کەرەسەیەکی کانزایی خاوە بریتیە لە کالیسیۆم گۆگرداتی کریستاڵی ڕۆشن. |
| زبدة مع عسل | Butyrome | کەرەو هەنگوین، جۆرە خواردەمەنی‌یەکە. |
| زبد البحر = زبد امواج الشاطىء | Surf | کەفی دەریا، مەگنیسیۆم سلیکەیت ماددەیەکی نەرمی سپی کون کونە سەرئاو دەریا دەکەوێت. |
| زبد الموج | Spindrift = Surf | کەفی شەپۆلی دەریا، کەفی قەراغی دەریا. |
| زبدية = سلطانية | Bowl | کاسە= تەشپی. |
| زبدة الكاكاو | Cacao butter | کەرەی کاکاو، ڕۆنێکە لە تۆوی کاکاو دەردەهێنرێت. |
| زبدية = افوكادو = شجرة المحامي | Avocado | (ئەڤۆکادۆ)، درەختێکی گەورەی هەمیشە سەوزە گەڵاکەی گەورەیە گوڵەکەی بەشێوەی هێشویەکی زەردە بەرەکەی بچوك یان گەورەیە لە هەرمێ دەچێت ڕەنگەکەی سەوزە تامەکەی خۆش و بەنرخە لە دروست کردنی کێك و شیرینی و شۆربادا بەکاردێت دەنکەکەی گەورەیە. |
| زبدي | Butyric | کەرەیی. |
| زبدية السكر | Sugarbasin | شەکردان، قاپی شەکر . |

| | | |
|---|---|---|
| زبرينة | Wandering-jew = Zebrlna | (زيبرينا)، گيايەكى خشۆكە لاسكەكەى شۆڕە گەڵاكەى ئەرخەوانيە بۆ ڕازاندنەوەى باخچەكان بەكاردێت. |
| زبرا | Zebra | زێبرا، كەرەكێوى. |
| زبرج - حلية | Gold = Ornament | زێڕ- ئاڵتون- خشڵ. |
| زبرج | Scud | هەورێكى تەنكە. |
| زبرجد - زمرد مصرى | Beryl | (بريل)، زوبەرجەد، بەزرەبينە، (زمروت). بەردێكى بەنرخە بۆ ڕازاندنەوە بەكاردێت بريتيە لە سليكاتى بريليۆم و ئەلەمنيۆم يان سليكاتى ئاسن و مەگنيسيۆم و كرۆم. |
| زبرجد اخضر مصفر | Peridot = olivine | (پێريدۆت)، زوربەرجەدى سەوزى مەيلەو زەرد. |
| زبرجد اخضر | Beryl = emerald | (ئێميرالد)، زوربەرجەدى سەوز. |
| زبرجد ازرق - زبرجد اكوامارين | Aquamarine | (ئەكوامارين)، زوربەرجەدى شين، بەردێكى بە نرخە. |
| زبرجد اصفر = زبرجد زيتوني | Chrysolite | (كريزۆليت)، زوبەرجەدى زەرد. |
| زبرة الاسد | Leonis | يالى شێر- ئەستێرەيەكە. |
| زبزب - غرير | Badger | چالەگە- چوالو- گياندارێكى شيردەرى خرينى پەلكورتە پێستەكەى بەنرخە لە ژێر زەويدا دەژى. |
| زبزب العسل - غرير العسل | Honey- badger | چالەكەى هەنگوين- جۆرێكە لە چالەكە حەز بە هەنگوين خواردن دەكات. |
| زبط - وحل | Mud = slime | قوڕ، قوڕوليتە. |
| زبل - سرجين - سرقين - دمن | Dung = droppings = manure = guano | شياكە، تەرس، پيساى گياندار. |
| زبل | Stable- litter | كلێش، ڕايەخى ئاژەڵ، ئەو پوش و پەلاشەيە كە لە تەويلەدا ڕادەخرێت بۆ ڕاكشانى ئاژەڵ. |
| زبل - قمامة - كناسة | Sweepings | سەرەنوێلك، زبڵخانە. |
| زبلين - سمور | Sable = zabellina | سەمور، سەفۆرى، گياندارێكە لە دەڵەك دەچێت پێستەكەى بەنرخە. |
| زبود - مريون | Zapus | (زاپەس)، جۆرێكە لە گياندارى گۆڕهەڵكەنە. |
| زبون = قباء | Meriones | كەوا، پۆشاكێكە لە پێشەوە كراوەتەوە لەسەر جلوبەرگەوە لەبەردەكرێت. |
| زبون | Customer | كڕيار، مەعميل. |
| زبيب = عنجد | Raisins = driedgrapes | مێوژ، مێوێژ: هەچكوچى. |
| زبيب = سم الافاعى | Venom = venene | ژەهرە مار. |
| زبيب رومي - كشمش | Currants = sultanas | كشميش، جۆرێكە لە ترێ بەرەكەى بە وشكى سورە دەكرێتە خواردەمەنيەوە. |
| زبيب برى | Stavescare | مێوژە كێويلە، ڕوەكێكە دەرمانى ڕشێنەوەو ڕەوان كردن و كرم كوژ لە تۆوەكەى دەردەهێنرێت. |
| زبيبة | Froth | كەفى لالفاوە. |
| زبية | Antsnest | شارە مێروولە. |
| زبيدي | Chondroplites = chinensis | زوبەيدى، تەنكە ماسى، جۆرە ماسيەكى پانكەڵەى كڕكڕاگەدارە گۆشتەكەى نايابە. |
| زبيدي | Butter- flavoured- truffle | دومەڵانى كەرەيى، جۆرێكە لە دومەڵان بۆنى كەرەى لێ دێت. |
| زبيدة - آذريون الحدائق جهوان | Potmarigold | گيايەكى كێوى پزيشكيە گوڵى زەرد دەگرێت لە هەميشە بەهار دەچێت بۆ زەردكردنى ڕەنگى كەرە بەكاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| زبي - ايري - قضيبي | Penial | كێری، چوكی، شتێك پەیوەندی بە چوكەوە هەبێت. |
| زبيزية | Wildthyme | جاترە كێویلە. |
| زبيل - زنبيل | Fruit basket | زەمیلە، سەبەتە. |
| زج -نعامة | Ostrich | وشترمر- باڵندەیەكی گەورەی بیابانیە توانای فڕینی نیە. |
| زجاج = قزاز | Glass = vitrum | شوشە- ماددەیەكی ڕەقی ڕونە بە ئاسانی پاك دەكرێتەوە گەلێك جـۆری هەیە لە خوێی كانزای و لم دروست دەكرێت بە گەرم كردنێكی زۆر گەلێك سوودی هەیە وەكو دروست كردنی قاپ و زەڕبێن و شوشەی پەنجەرە. |
| زجاج مشجر | Dendritic glass = dendroid glass | شوشەی سەهۆڵی، شوشەی نەخشاوی. |
| زجاج مـائي - ذوب زجـاجي - ماء الزجاج | Water glass | گیراوەی سـۆدیۆم سـلیكەیت لـە ئـاودا، شـلەیەكی خەسـتی لینـج پێـك دەهێنێـت لـە دروسـتكردنی مادەی پاكـەرەوەی وەك سـابون و سـرێش و مقەباو ئەو چنراوانەی بەرگەی ئاگر دەگرن بەكاردێت. |
| زجاج باريكس | Pyrex glass | شوشەی پایریكس، جۆرێكە لە شوشە بەرهەڵستی گەرمی دەكات ئامانی تاقی كردنەوەی لێ دروست دەكرێت. |
| زجاج طبيعي - اوبسيديان | Obsidian | شەوشەی سروشتی، شەوشەیەكی گركانیە بەزۆری ڕەنگەكەی ڕەشە، لە گرانیتدا هەیە وەك بەردێكی بەنرخ بەكاردێت. |
| زجاج كراون - زجاج تاجي | Crown glass | شوشەی تاج، جۆرێكە لە شووشە زۆر پاكـە لـە دروسـتكردنی زەرەبینـی كامێراو میكرۆسكۆپدا بەكاردێت ئۆكسیدی كالسیۆمی تیادایە. |
| زجاجة ساعة | Watch glass | شوشەی كاتژمێر، لەتاقیكردنەوەی كیمیایدا بەكاردێت. |
| زجاج الامان | Safety glass | شوشەی بێزیان، شوشەی بێ وەی، لە پەنجەرەی ئوتومبیلدا بەكاردێت. |
| زجاج ليفي | Fiber glass | شوشەی ڕیشاڵی، ڕیشاڵی شوشە. |
| زجاج | Glazier | شوشە فرۆش. |
| زجاجة (قنينة) | Bottle | بوتڵ، دەفرێكی شوشە كە شتومەكی تێ بكرێت. |
| زجاج ضد التناثر | Shatter proop glass | شووشەی دژی پەرشی و بڵاوبوونەوە لەكاتی شكاندا. |
| زجاجة ديلاتومتر | Dilatometer | (دیلاتومەتر)، شوشەیەكە بۆ پێوانی خاڵی گۆڕانی شلە بە تێبینی كردنی كشانەكەی. |
| زجاجة كوبلت | Cobalt glass | شوشەی كۆباڵت، پارچە شوشەیەكی مۆرە خوێیەكانی كۆباڵتی تیادایە بۆ سەیركردنی گڕی كانزاكان بەكاردێت. |
| زجاج السليكا | Silica glass | شووشەی سلیكا. |
| زجاجة ليدن | Leyden jar | شوشەی لیدن، ئامرازێكە بۆ كۆكردنەوەی كارەبا بەكاردەهێنرێت. |
| زجاج بصري | Optical glass | شووشـەی بینیـن، ئـەو شووشـەیەی كـە لـە دروسـت كردنـی چاویلكـەو كامێراو میكرۆسكۆپدا بەكاردێت. |
| زجاجة ساترة = غطاء زجاجي | Cover glass | شوشەی داپۆشین، بۆ داپۆشینی سلایدی میكرۆسكۆپی بەكاردێت. |
| زجاج صخري | Flint glass | شوشەی بەردین، شوشەی فلینت شوشەی ئەستێی، جۆرێكی چاك و پاكە لە سلیكا. |
| زجاج البايروسيرام | Pyroveram | شووشەی پایروسـیرام، شووشـەیەكە بـە شـێوەی تـۆز (هـاڕاوە) بەرگـەی گەرمی دەگرێت بۆ لۆك كردن بەكاردێت. |
| زجاج فلنت | Flint glass | شوشەی فلینت، جۆرێكی زۆر پاكە لە شوشە لـە دروستكردنی زەرەبینی كامێراو میكرۆسكۆپدا بەكاردێت ئۆكسیدی قورقوشمی تیایە. |

| | | |
|---|---|---|
| زجاج احمر | Red glass | شووشەی سور، جۆرێکە لە شوشە ڕەنگە سورەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بونی کوپەرۆز ئۆکسایدی یان کلۆریدی زێڕ. |
| زجاج الصودا الجيرية | Soda-lime glass | شووشەی سۆدالایم. بۆ مەبەستی دروست کردنی شوشەی پەنجەرە بەکاردێت. |
| زجاج صفيحي | Sheet glass | تەبەقە شوشە. |
| زجاج مغزول | Spun glass | شوشەی ریشاڵی، ڕیشاڵی شوشە. |
| زجاجي | Vitreous = glassy | شوشەی، شتێك پەیوەندی بە شوشەوە هەبێت. |
| زجاج | Clove | دەنگی مێخەك، تۆو یان بەری درەختی مێخەك. |
| زجر = حفش | Sturgeon | (ستەرجیۆن) جۆرە ماسیەکی گەورەیە کافیاری لێ دەردەهێنرێت. |
| زجم = سنونو الماء | Sea- swallow | پەڕەسێلکەی دەریا، جۆرە باڵندەیەکە. |
| زحار | Dysentery | زەحیری، کەفسە، دیزانتری، سکەشۆری، سکچون، هەندێك جار بەخوێنەوە دەبێت. |
| زحار اميبي | Amoebic- dysentery | زەحیری ئەمیبی، جۆرە نەخۆشیەکی سکچونە تایبەتیە بە هەرێمە گەرمەکان لە ئاسیادا. ئەم نەخۆشیە درم نیە وەك جۆرە زەحیریەکە کە (باسیلی) پێ دەڵێن و، بەهۆی جۆرە میکرۆبێکی تایبەتیەوە (ئەمیبیا) کە لە ڕیخۆڵەی ئەستورا دەمێنێتەوە، بڵاودەبێتەوە. |
| زحار المواشي | Scours | زەحیری ئاژەڵ، جۆرە نەخۆشییەکە. |
| زحـــار عصـــوي = زحار باسيلي | Bacillus- dysentery | زەحیری باسیلی، بەهۆی بەکتریای (باسیلی)یەوە بڵاودەبێتەوە وە ئەم میکرۆبە لە پیسایی نەخۆشدا بە زۆری هەیە هەروەها درمیشە و بەخێرای بڵاودەبێتەوە لە نەخۆشەوە بۆ ساغ بەتایبەتی لە هەرێمە گەرمە مام ناوەندیەکاندا. |
| زحاف = زاحف | Creeping | خشۆك. |
| زحافات = زواحف | Reptiles = reptilia | خشۆکەکان: گیانداری خشۆك وەکو کیسەڵ. |
| زحزحة | Shifting = perturbation | خزان، جێ لێژبون، لاچون، چونەدەرەوەی تەنۆکەیەك لە سوڕگەکەی (ڕێڕەوەکەی) خۆی بەبێ ئەوەی بەر شتێکی تر کەوتبێت. |
| زحزحة دوبلر | Doppler- shift | لاچونی دۆپلەر، چونەدەرەوەی دۆپلەر، گۆڕانێکی کەم لە شوێنەکانی هێڵەکانی شەبەنگی هەندێك لە تەنە ئاسمانیەکان. |
| زحف | Creeping = crawling | خشین، خشان، سکەخشێ. |
| زحل | Saturn | کەش، کەیوان، کەنو، کاروان کوژە، کاروان قران، (ساتۆرن)، شەشەم ئەستێرەی گەڕۆکە (٨٨٧) ملیۆن میل لە خۆرەوە دورە، تیرەکەی (٧٥٠٠٠) میلە لە ٢٩ ساڵ دا سوڕێك بە دەوری خۆردا دەدات بەوە ناسراوە کەوا ئەڵقەی بەدەورەوەیە تەنیا لە تەلسکۆپدا دەردەکەوێت (٩٥) ئەوەندەی گۆی زەویە، ئەستێرەیەکی بەیانیە دوای نیوەشەو بەیەك سەعات هەڵ دێت. |
| زحلقة = تزحلق | Sliding = skating | هەڵخلیسکان، داخزان. |
| زحلوقة | Ski | پێڵاوی بەفرەخلیسکێ. |
| زحمة = ازدحام | Crowd | قەڵەباڵغی، قەرەباڵغی. |
| زحموك = كشوت | Dodder = wild-loranthus | گیاکەڵە، گورگە، ڕوەکێکی مشەخۆرە خۆی بەقەدی ڕوەکی ترەوە هەڵدەواسێ زیانی پێ دەگەیەنێت. |
| زخات المانكة، زخات الازهار | Mangoshowers | نمەی مانگۆ، بارانێکی بەهارییە، لە باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیادا دەبارێت. |

| | | |
|---|---|---|
| زخة | Drizzle | پریشك، پرشه. |
| زخة المطر = نخة | Ashower of rain = drizzle | نم، نمه، وردەباران، تاوی باران، تاڤیابارانێ، تاوەباران. |
| زخة مطرية غزيرة | Cloud burst | نمەبارانی بەتین. |
| زخة = حمل | Lamb | بەرخ (بێچوی مەڕ). |
| زخرف = زينة | Ornament = decoration | زێوەر، دیکۆر، نەخش و نیگار. |
| زخرف = قمص = شابرة الماء | Hydrometra | ئاو رۆشن کەرەوە، مێروویەکە بەسەر رووی ئاودا هاتووچۆ دەکات. |
| زخرط | Glair | چڵمی شل، چڵمی ولاغ. |
| زخم = تعجيل | Momentum = impetus | گوڕ، تاو پاڵ پێوەنانێکی بەتین، تەوژم، ئەنجامی لێکدانی خێرایی لە بارستای. |
| زخمة = رائحة كريهة | Stench = badsmell | بۆگەن. |
| زخمة | Waist coat = vest | سوخمە، کراسێکی کورتە لە پێشەوە کراوەتەوە بە زۆریی ژنان بەکاری دەهێنن. |
| زخمة الطبلة | Drum stick | ئەو دارەی کە تەپڵی پێ لێ دەدرێت. |
| زخم زاوي = عزم الزخم | Angular - momentum | گوڕی گۆشەیی، زەبری گوڕ. |
| زداع = دميانة | Turnera | روەکێکی پزیشکیە قەدەکەی توکنە جۆرە رۆنێك لە قەدو گەڵاکانی دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت بۆ بەهێزکردنی هێزی رەگەزی. |
| زدب | Portion | بەش. |
| زدوار = جدوار = كركم | Zedoary = selwall | زەردەچەوە، روەکێکی کشتوکاڵی سەلکدارە لە دروستکردنی دەرمان و بۆنی خۆش و داودەرمانی ئارایشتدا بەکاردێت. |
| زر ، دكمة | Bud = button | بشکور، قۆپچە، دوگمە، پشکۆك، بکشۆژ. |
| زر = جمان | Stud | بزماری کلیپس. |
| زر الزهرة = برعم | Flower bud | خونچە، گۆپکەی گوڵ. |
| زر الذهب = حوذان حريف | Crow foot = butter cup = bachelors button | دوگمەی زێڕ، جۆرە گیایەکە گوڵێکی زەرد دەگرێ لە هەمیشە بەهار دەچێت. |
| زر الطربوش = شرابة | Tassel | فسکول، ریشوی فێست. |
| زراعة مائية | Hydroponices | کشتوکاڵی ئاوی، چاندنی روەك لە گیراوەی ئاوییدا یان لە ناو لمداو کانزای پێویستی بە شێوەی خوێی ئا ئۆرگانی تواوە لە ئاودا بۆ زیاد دەکرێت هەروەها پێشی دەگوترێت کشتوکاڵی بێ خاك. |
| زرافة | Giraffe = camelopard | وشتر پڵنگ، وشتر بەڵەك، وشتر مل، گیاندارێکی سمداری کاوێژکەرە بەقەدەر وشترێك دەبێت دەستی درێژە قاچی کورتە ملی درێژە دو شاخی بچوکی هەیە پێستەکەی پنکە پنکەیە. |
| زرافة | Cameloparalis = giraffe | وشتر پڵنگ، وشتر بەڵەك، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باکورییە. |
| زراق = ازرقاق | Cyanosis | شین هەڵگەران. |
| زراق الاطراف | Acrocyanosis | دەست و پەل شین بوونەوە. |
| زراعة = زرع | Sowing = growing = planting = cultivation = agriculture | کشتوکاڵ، رواندن ، تۆوچێنی . |
| زراعة البواكير | Forced cultivation | کشتوکاڵی نۆبەرە، جۆرێکە لە کشتوکاڵ بە گەرمی یان روناکی دەستکرد ئەکرێت لە ژووری شووشەدا بۆ ئەوەی زووتر پێ بگات وەکوو تەماتەو خەیار. |

| | | |
|---|---|---|
| زراعي | Agricultural =agronomic | كشتوكالْی ، هەر شتێك پەیوەندی بە كشتوكاڵەوە هەبێت . |
| زراع، زارع | Famer = cultivator | كشتكار، جوتیار. |
| زراعة المدرجات | Terrace cultivation | كشتوكاڵی تەلان، كشتوكاڵی پلیكانەیی، وەكوو لە قەراغی چیاكاندا دەكرێت. |
| زراعة سيحية | Hydro ponics | كشتوكاڵی بەراو، ئەو كشتوكاڵەی كە بە ئاوی جۆگە و ڕووبار دەكرێت. |
| زراعة ديمية - زراعة جافة | Dry farming | كشتوكاڵی دێمەكار، ئەو كشتوكاڵەی كە تەنها بە ئاوی باران دەكرێت. |
| زراعة الانسجة - زرع الانسجة | Implantation | ڕواندنی شانە، گواستنەوەی شانەی لەش لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر بەپێی پێویست. |
| زراعة الفسيفساء | Mosaiculture | كشتوكاڵی ڕازاندنەوە، ڕواندنی گوڵ و ڕووەكی ڕازاندنەوە بە شێوەیەكی ئەندازیاری بۆ مەبەستی جوانی. |
| زراريق | Elanus | (ئیلانەس)، باڵندەیەكە لە كۆلارەو هەڵۆ دەچێت. |
| زرام - احتباس البول | Anuria | میزەچۆڕكێ، میزگیران. |
| زراقة | Siphon | دەرزی، بۆری. |
| زراوند - ارستولوخية | Birth wort = aristolochia = maurorum = serpentary = wormkiller | (ئەرستولوكیا)، گیایەكی خشۆكی ڕیشاڵیە گوڵی گەورەو سەیری هەیە دەرمانی لێ دەردەهێنرێت بۆ برین و گوڵ. |
| زرب الأرض = هالوك، زب الارض | Dodder = wild = loranthus | گیاكەڵە، گورگە، ڕووەكێكی مشەخۆرە. |
| زربة - سرية | Flock | جەڵەب، مێگەل، ڕەوە. |
| زرب = حظيرة | Pen = fold | تەویلە، پشتێر. |
| زرب | Folding | مەڕوماڵات خستنەتەویلەوە. |
| زربيح - شاي مكسيك | Mexicantea | چای مەكسیك، گیایەكە گەڵاكەی بۆن خۆشە وەكو چای بەكاردێت. |
| زربيح - فساء الكلاب - رمرام - بزر الدود | Wormseed = wall goose foot | شاتەرە كێویلە، تسی سەگ، جۆرە ڕووەكێكی كێوی پزیشكییە، تۆوەكەی بۆ كرم فڕێدان بەكاردێت. |
| زربي | Carpet = rug | فەرش. |
| زربول | High heeled boots | پێڵاوی پاژنە بەرز. |
| زرجة - ازرار | Buttom | دوگمە، بشكوژ. |
| زرجونة - كرمة - سرع | Grape vine = vine- shoot | (١) لقی‌مێو، تەرزی داری مێو. (٢) داری مێو. |
| زردة - حلاوة زردة | Sweet meat | حەڵوای گوڵەزەرد. |
| زرد - حمار الزرد - عبر - عتابي | Zebra = wild ass | (زێبرا)، كەرە كێوی. |
| زرد - إختناق | Strangulation | خنكان. |
| زردمة | Throat = gullet = glottis | زمانە بچكۆلە، زمان كچكۆلە، گەرو. |
| زردة - حلقة | Link = ring | ئەڵقە. |
| زردة - فنك = ثعلب الصحراء | Fennec = zerda | ڕێوی بیابان، فەنەك، وەنەك، ڕێوییەكی ئەفریقی بچووكە. |
| زردي - إبن عرس | Weasel | راسو، مشكی خورما گیاندارێكی گۆشتخۆرە لە پشیلە دەچێت. |
| زردق - قرطم - عصفر - بهرم - بهرمان | Safflower = wolly safflower | زەرتك، كاژێرە، ڕووەكێكە ڕەنگی زەردی لێ دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| زردية | Pliers | گاز، پلایسی قرتاندنی تەل. |
| زرزور | Starling | سێرو، قژۆڵە، ڕیشۆڵە، گاوانی. |
| زرشـــك - بربـــاريس - انبر باريس - عود الريح | Barberry = berberis | زریشك، دەوەنێكی دڕكاویـە بـۆ ڕازاندنـەوە بـەكاردێت بەرەكـەی لـە تـرێ دەچێت زەرد یان سورە ڕەنگی لێ دەردەهێنرێت. |
| زرع = زراعة | Planting = cultivation | ڕواندن، دانەوێڵە. |
| زرع الدم | Hemoculture | ڕواندنی خوێن، گواستنەوەی خوێن بۆ لەشی مرۆڤ. |
| زرعة - منبت | Culture | هـــەر مادەیـــەك بـــۆ ژیـــان و زاوزێ كردنـــی زینـــدەوەری ورد بەكاربهێنرێت. |
| زرع غير محصود | Unreaped- plants | تەبارە، كشتوكاڵی نەدوراوە. |
| زرقة - زرق | Blue | شیناى، شینی. |
| زرقة السيان | Alcian blue | شینی ئەلیسیان، جۆرە ڕەنگێكە. |
| زرقة السماء | Blue of the sky | شینایی ئاسمان. |
| زرقة سكسونيا | Saxony blue | چویتی شین، جۆرە ڕەنگێكە. |
| زرق - غلوكوما - الماء الازرق في العين - سعيقة - الماء الاسود | Glaucoma | گلوكۆما، تەمی چاو، ئاوی شین، ئاوی ڕەش. |
| زرق ملوكي | Royal blue | شینی شا، شاشین، بۆیەیەكی شینە. |
| زرقة فكتوريا | Night- blue = victoria blue | شینی ڤیكتۆریا، بۆیەیەكی كیمیایی لە بەنزۆل دەردەهێنرێت. |
| زرق - ذرق | Mute = columbine | ڕیقنە= جیقنە- ساق. |
| زرق - سبر | Black winged kite = marsh harrier = white falcon | هەڵۆی سپی، باڵندەیەكی ڕاوكەرە لە نێوانی بازو واشەدایە. |
| زرقة كوبلت | Cobalt blue = leyden blue | شینی كۆباڵت، تێكەڵاوێكە لـە ئۆكسیدی كۆبـاڵت و ئـەلۆمنیۆم بەشێوەی ڕەنگ بەكاردێت. |
| زرقة ترمبل - زرقة برلين - زرقة بروسيا - زرقة ترنبول | Turnbulls- blue = prussianblue = Berlin blue | شینی تـەرنبۆل، شینی تـەرمبل، شینی بـەرلین، شینی پروسیا، ڕەنگێكی شینە. |
| زرقة الصين | Chinese blue | شینی چین، جۆرە ڕەنگێكە. |
| زرقة المثيلين | Methylene blue | شینی مەثیلین، جۆرە ڕەنگێكە. |
| زرق الطير | Mistle toe | دەموكانـە، دەموكانـەی بـەرو. ڕوەكێكـی مشـەخۆرە زیـان بـە درەخـت دەگەیەنێت. |
| زرقة ثنارد | Thenards blue | شینی ثینارد، ڕەنگێكی شینە لە سوتانی تێكەڵاوی ئۆكسیدی ئەلەمنیۆم و نیتراتی كۆبڵت پەیدا دەبێت. |
| زرق الابر | Injection by syringe | شرنقەلێدان، دەرزی لێدان، كوتان. |
| زرقاوى - زرقيون | Scaup- duck | شینەمراوی، جۆرێكە لە مراوی. |
| زرقون - زركون - زرقن | Zircon = jargon = jacinth = hyacinth | (زێركۆن)، بەردێكی كریستاڵی بەنرخە كەرەسەیەكی خاوە بۆ زێركۆنیـۆم بریتیـە لـە سـلیكاتی زێركۆنیـۆم بریسـكەدارە ڕەنگەكـەی قـاوەی یـان خۆڵەمێشی یان سورە بەشێوەی مادەی كرێنەر یان بەردێكی بەنرخە یان لە دروست كردنی ئامرازی گەرمیدا بەكاردێت. |
| زرق ملوكي - زرقة ملوكية - زرقة بروسية | Royal blue = prussina blue | شینی پاشای، شینی پروسیا، ڕەنگێكی كیمیای شینە. |

| | | |
|---|---|---|
| زرقطة - دبر | Yellow hornet = french wasp | زەردەزیرە، زەرگەتە. |
| زركشة | Todecorate | زرکێش کراو، زەرکەش کراو، ئاڵ و والا. |
| زركش | Tapestry | زرکێش، قوماشێك لە دەزوی ئاوریشم و زیو چنرا بێت. |
| زركون | Zircon | راجع (زرقون). |
| زركونيا | Zirconia | (زێرکۆنیا)، ئۆکسیدی زێرکۆنیۆم. |
| زركونيوم = زرقونيوم | Zirconium | (زێرکۆنیۆم)، ڕەنگ زێڕی توخمێکی کیمیاگەریە کێشی ئەتۆمیەکەی (٩١,٢٢) ژمارەی ئەتۆمیەکەی (٤٠) کانزایەکی خۆڵەمێشیە مانکەی (ڕەنگی ئاڵتونی) دەگرێتەوە. نیشانەکەی (*Zr*). |
| زركونات | Zirconate | (زیرکۆنەیت)، خوێی ترش زیرکۆنیك. |
| زر الجرس الكهربائي | Push = button = bell- push | سویچی کارەبا دوگمەیەکە کارەبای پێ دادەگیرسێنرێت یان دەکوژێنرێتەوە. |
| زرنبة = جبل الزهرة | Monsbubis | بەری ئافرەت، بەشی سەرەوەی شەرمگەی ئافرەت. |
| زُرُنب = زُرُمب = جدوار = زنجبيل | Zedoary = zerumbet = wild ginger | زەنجەفیل، جۆرێکە لە بەهارات. |
| زرنيخ | Arsenic | زەرنیق، توخمێکی کیمیاگەریە کێشی ئەتۆمیەکەی (٧٥) و ژمارەی ئەتۆمیەکەی (٣٣)ە، ناکانزایە ڕەنگی زەرد و خۆڵەمێشی و قاوەی و پیرۆزەی هەیە، ناوەکەی لە ئاڵتونی زەردەوە هاتووە ئاوێتەکانی بۆ دروست کردنی ژەهر بەکاردێن. نیشانەکەی (*AS*). |
| زرنيخوز | Arsenious | ئەرسینۆز، وەکو ترشی ئەرسینۆز. |
| زرنيخيك | Arsenic | ئەرسینیك، وەکوو ترشی ئەرسینیك. |
| زرنيخات | Arsenate | (ئارسینەیت)، خوێی ئەرسنیك ئەسید. |
| زرنيخيت | Arsenite | (ئارسینیت)، خوێی ئەرسینۆز ئەسید. |
| زرنيخ ابيض = سم الفأر | Rats bane | ژەهری مشك، مەرگەموش، سێهەم ئۆکسیدی زەرنیق. |
| زرنيخات الكالسيوم | Calciumar senate | ئەرسیناتی کالیسیۆم، دەرمانی مێش و مەگەز. |
| زرنيخات الرصاص | Lead arsenate | ئەرسیناتی قورقوشم، دەرمانێکە بۆ قەلاچۆکردنی مێرو گژوگیای زیان بەخش. |
| زرنيخات الزنك | Zinc arsenate | ئەرسیناتی زینك، دەرمانێکە دەکرێت بە ڕووەکەوە بۆ بەرهەڵستی مێروو. |
| زرنيخ احمر | Realgar = red arsenic | دوەم گۆگردیدی زەرنیق، ئارسینك سەلفایدی سروشتی. |
| زرنيخيت الصوديوم | Sodium- arsenite | (ئارسینتی سۆدیۆم)، دەرمانی کوللە، دەرمانێکی ژەهرە دژی کوللە بەکاردێت. |
| زرنيخيت النحاس = خضرة شيل = اخضر ريمان | Cupric arsenite = green smalt = scheeles- green = rimmans- green | سەوزی شیل، (ئارسینتی مس) ڕەنگێکی سەوزە. |
| زرنبوك = زهرة الثلج | Snow drop = fringe tree | گوڵە بەفر، دەوەنێکە لە کۆمەڵەی زەیتون گوڵەکەی سپیە. |
| زرهون = زهر العزيز | Crossande- tree | گوڵە ئازیز، دەوەنێکە گوڵەکەی بۆن خۆش و هەمە ڕەنگەیە. |
| زرياب - قيق - ابو زريق | Jay | بۆرەك، جۆرە باڵندەیەکە لە قەلەڕەشکە دەچێت وەکو توتی لاسای دەنگ دەکاتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| زربية - حظيرة | Pen = fold for cattle = stockade = sty = sheep fold = zareba = zariba = paddock | پشتر، پەچە، تەویلە، ئاغەڵ، گەلەخان، گەوڕ، ئاغوێر، مۆڵگە، داڵدە، کوتان، پادۆك، بەهاربەن، شوێنی حەوانەوەی ئاژەڵ. |
| زربية الخنازير | Sty = piggery = pigsty | تەویلەی بەراز، پشتیری بەراز. |
| زربية المعزى | Goat fold | پشتیری بزن، گەوڕی بزن. |
| زريرة = زعفران الجبـل - سورنجان | Meadow- saffron | سورنجان، سورەجان، زەعفەرانە کێویلە ڕووەکێکە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| زريق - ابو زريق | Jay | راجع (زرياب). |
| زرقاء = رباح غابون | Rasse = genette = genetta = genet | (جێنیت)، گیانداریکی کێوی گۆشتخۆرە لە پشیلەی مسك دەچێت بەلام گەورەترە ڕەنگەکەی ڕەشە یان خۆلەمێشیە پەڵەپەڵەی سپی تێدایە لە خواروی ئەفەریقادا دەژی پەڵەکانی کورتن و لەشی درێژە. |
| زريقة = صعوة = سكسكة | Lesser white- throat = wren | جۆرێکە لە چۆلەکە. |
| زريقة - شلبة = أم دنقيس | Bream = schilbe | (شلبە) جۆرێکە لە ماسی. |
| زريـــج - آذان الـــدب - برباشـــكه = بوصـــير = جوزناق | Mullein = turnsola = leavedcroton = verbascum | گوێ ورچە، ڕوەکێکە لە هەندێك ولات دەڕوێت بەشێوەی دەرمانی لۆکە و ئاوسانی سیەکان بەکاردێت. |
| زعاف (سم) | Deadly- poison = venom | ژەهری کوشندە. |
| زعامة = رئاسة | Leader ship | پێشەوایەتی. |
| زعبج = طافر - طخرور | Altostratus | هەورێکی تەنکی سپی سوکەڵەی نزمە. |
| زعبل | Cotton tree = cotton plant | ڕوەکی لۆکە. |
| زَعَبل | Fatand fine- necked | مرۆڤی قەڵەوی مل باریك. |
| زعبوبة - زوبعة | Whirl wind | ڕەشەبا. |
| زعتر - سعتر = صعتر | Thyme | جاترە، کاکوتی، جانترە، جعیدۆك هەزبیە کێویلە، ئەزبیلە، هەزبی، هەزبیلە، ئەزبی، گیایەکە بۆنەکەی زۆر خۆشە لە بۆنی نەعنا دەچێت گەڵاکەی دەکرێتە خواردنەوەو ڕۆنی جاترەی لێ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی. |
| زعرة | | راجع (ذعرة). |
| زَعِر = أزعر | Thin- haired | کەم توك، کەم قژ. |
| زعرور - تفاح البر | Hawthorn = may = neapolitan- medlar-azarole wild damson = rhamnus = disperma- ehrbg = crataeegus | گوێژ، گوێژ، گێوژ، بلچ، تەنگیز، ریلیٚ ، گوهیشك، درەختێکی کێوی دڕکاویە لە ناوچە ساردەکاندا دەڕوێت گوڵەکەی سپیەو بەرەکەی وەك هەڵمات وایە زەردەو سوری هەیە، ترش و شیرینە دەنکی ڕەقی تیایە. |
| زعرور امريكا = اغراس امريكي - سبوتة | Sapodilla = sapota, Nase berry | گوێژی ئەمەریکا، (نیسبێری) درەختێکی گەورەیە گوڵەکەی وەکو زەنگوڵەی سپی وایە بەرەکەی خڕیان هێلکەییە بەقەدەر پرتەقاڵێکی بچوك دەبێت ناوکەکەی پرتەقاڵیەکی مەیلەو سورو زۆر شیرینە دەنکەکەی لاکێشەییە ماددەی (شیکل) کە جۆرێکە لە بنێشت لە قەدەکەی دەردەهێنرێت. |
| زعرور ارجواني الثمر | American = haw thorn | گوێژی ئەرخەوای، جۆرێکە لە گوێژ بەرەکەی ئەرخەوانییە. |
| زعرور اصفر الثمر | Yellow- fruit haw thorn | گوێژی زەرد، جۆرێکە لە گوێژ بەرەکەی زەردە. |

| | | |
|---|---|---|
| زعرور اسود الثمر | Black- fruit haw thorn | گوێزی ڕەش، جۆرێکە لە گوێز بەرەکەی ڕەشە. |
| زعرور جرماني = مشملة = زعرور بستاني | Medlar tree | گوێزی جەرمەنی، گوێزی باخی، درەختێکی بەردارە بەرەکەی لە سێوێکی بچوك دەچێت ڕەنگەکەی قاوەییە تامەکەی ترش و تفتە بەرهەڵستی گۆڕانی کەش و نەخۆشی ڕوەك دەکات. |
| زعرور اليابان = بشملة = اكي دنيا | loquat = japanese medlar | یەنگی دونیا گوێزی یابان، درەختێکی بەردارە. |
| زعرور بنفسجي | Violet = haw thorn | گوێزە مۆرە، سوربلەتی. |
| زعرورية | Shad berry = shad bush = june berry | گوێزۆکە، درەختێکی بەرداری بچووکە لە گوێز دەچێت بەرەکەی سورە لە ترێ دەچێت. |
| زعروع | Spindle- shanks | لاق درێژ و باریك، کەسێك لاقی درێژ و باریك بێت. |
| زعزع = زعزعان = سهوك | Fresh breeze | جۆرە بایەکە خێراییەکەی (٨) مەترە لە چرکەیەکدا، باران و بروسکەی لەگەڵدا دەبێت. |
| زعزعة | To shake | ڕاوەشاندن، ڕاتەکاندن، لەق کردن. |
| زعفران = جادي = جيهمان = رادن = صفران = ريهقان = رعبل = نب = غمار = ساد | Saffrion = Crocus | زەعفەران، زەرتەك، قاغاڵە، گوڵەخەنە، ڕوەکێکی پیازیە گوڵەکەی سوری مەیلەو زەردە بۆ ڕەنگ کردنی خواردەمەنی بە ڕەنگی زەردو بۆ مەبەستی پزیشکی بەکار دەهێنرێت. |
| زعفرانين = سفرنين | Safranin | (سافرانین)، مادەیەکی سوری مەیلەو پرتەقاڵیە لە زەعفەران دەردەهێنرێت ڕەنگی پێ دەکرێت. |
| زعفران المروج = زريرة = زعفران الجبل | Meadow-saffron | زەعفەرانی مێرگ، زەرتەکی مێرگ، قاغاڵەی مێرگ، ڕوەکێکە گوڵێکی وەنەوشەی کاڵی هەیە لە پایزدا گوڵ دەکات، ژەهرێك لە سەلك و تۆوەکەی دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی نەخۆشی پێ خرە (نقرس) بەکاردێت. |
| زعفران هندي = كركم = ورس = عرد | Indian-saffron | زەردەچەوە، زەعفەرانی هیندی. |
| زعفة = سعفة | Palm- branck | لقی دارخورما. |
| زعفر | Zaffer = zaffre | (زافیر)، تێکەڵاوێکە لە ئۆکسیدی کۆباڵت و سلیکا بۆ ڕەنگ کردنی شوشەو فەخفوری بەشین بەکاردێت. |
| زعفران الحديد | Crocus martis | زەعفەرانی ئاسن، زەرتکی ئاسن، بریتیە لە ئۆکسیدی ئاسنی سور کە لە گەرم کردنی گۆگرداتی ئاسنۆز پەیا دەبێت لە کرداری ساف کردن و بۆیە کردندا بەکاردێت. |
| زعنفة | Fin = flipper | پەرەکەی ماسی، پەرەی ماسی، پەرەکە، ئینجە، فینجە، هەنگۆڵی، ئەندامێکە لە ماسیدا لە باڵ دەچێت یارمەتی مەلەکردنی دەدات. |
| زعنفة الحوت | Flipper | پەرەکەی نەهەنگ. |
| زعنفة ظهرية | Dorsal fin | پەرەکەی سەرپشت. |
| زعنفة كتفية | Shoulder fin | پەرەکەی شان، پەرەکەی سەر شان. |
| زعنفة بطنية | Ventral fin = abdominal fin | پەرەکەی ژێر سك. |
| زعنفة حوضية | Pelvic fin | پەرەکەی سێ بەندە. |
| زعنفة شرجية | Anal fin | پەرەکەی کۆم. |
| زعنفة ذنبية (ذيلية) | Caudal fin | پەرەکەی کلك. |

| | | |
|---|---|---|
| زعنفيات الاقدام | Pinnepedia = pinnipeds | قاچ پەڕەکەیییەکان، کۆمەڵە گیاندارێکی ئاوین وەکو گوێرەکەی دەریاو شێری دەریا، پێیەکانیان پەڕەکەییییە. |
| زعيق - صراخ | Shrieking = screaming | زریکە، زریکە زریك، زریك و هوڕ، قیژە، قیژە قیژ، قیژو هوڕ. |
| زغابة | Villus | مەمیلە. |
| زغابة معوية - خملة | Intestinal- Villus | مەمیلەی ڕیخۆڵە، وەکو ئەو مەمیلانەی کەوان بە دیواری ناوەوەی ڕیخۆڵە باریکەوە بۆ هەڵمژینی خواردەمەنی. |
| زغاري - شرشور جبلي | Mountain- Finch = brambling | چۆلەکە کێوی، باڵندەیەکی بچوکە وەکو فیرنەگولە پشتی ڕەش و سنگی پرتەقاڵی و سکی سپیە. |
| زغب - وبر | Down =nap = softhair = fluff | گەندەمو، کورك، توکی باڵندە، پەڕەمو. |
| زغب | Coma | توکی گەڵاو میوەو بەر. |
| زغبي | Alca | باڵندەیەکە باڵەکانی زۆر کورتن. |
| زغبي - خملي | Villose = villous | مەمیلەدار، مەمیلەی. |
| زغب الزهرة | Pappus | موی گوڵ، کوڵکی گوڵ، ئەو مووەی کە بە گوڵ و تۆوی ڕووەکەوە هەیە. |
| زغب نباتي شائك - سبسلاء | Cypsela | پەپولە پایزە، بەرێك یان تۆوێکی توکنە لە پایزدا بەهەوادا بڵاو دەبێتەوە وەکو بەری تاڵیشك. |
| زغب | Big | جۆرە هەنجیرێکی گەورەی خۆشە. |
| زغباء الراس | Downy head | سەرپەڕاویی مراویەکی ئەمریکیە سەرەکەی گەندە پەڕی زۆری پێوەیە. |
| زغبيج - عتم = زيتون الجبال | Oleaster = the wild olive | زەیتونە کێویلە، پەڕەکەی لە پەڕی تاوك یان گۆیژ دەچێت سەوزە ئنجا سپی ئنجا ڕەش و شیرین مەیلەو تاڵ دەبێ، دەکرێت بە چێشت و دەخورێت، ئاوەکەشی وەکو ئاوی ترێ دەگیرێت و دەخورێتەوە. |
| زغبارة | Stigmina | (ستیگمینا)، کەڕویەکی زیانبەخشە بەڕوەك. |
| زغبة - فار نوام = جرذ سنجابي | Dormouse = Loir | سمۆرە، سنجاو، سغۆرە، مشکە سمۆرەی، گیاندارێکی قرتێنەرە لە مشك دەچێت بەڵام گەورەترە لەسەر درەخت دەژی لە زستاندا مت دەبێت. |
| زغبر - شقال = لعوض - علوض | Jackal | چەقەڵ، تورگ، توێری. |
| زغبر =زغبار | | راجع (زغب). |
| زغبية | Silk cotton-tree | لۆکەی ئاوریشمی، درەختێکی گەورەیە دەنکەکەی ریشاڵی پێوەیە تۆوەکەی دوای برژاندن دەخورێت گەڵاکەشی ڕۆنێکی تایبەتی لێ دەردەهێنرێت. |
| زغداب | Chiromel | (چیرۆمیل)، جۆرێکە لە شەمشەمە کوێرە. |
| زغدة - زهرة الربيع | Primula | گوڵە بەهارە، جۆرە گیایەکە. |
| زغردة | Shake tremolo = Triblo = Trill | تلیلیلان، هەلهەلە. |
| زغزغة - دغدغة | Titillation | ختوکە، غدی غدی، گدی گدی. |
| زغلطة - فواق، حازوقة | Hiccough | نزگەرە. |
| زغف | Sprig | ترك، چیلکەو چەوێل، لقی درەخت. |
| زغفل - ياسنت مائي | Pontederia | (یاسنتی ئاویی) گیایەکی ئاویە گوڵی شین دەگرێت. |
| زغل - غش - تزييف | To adulterate = to debase | ساختە، فێل، قۆپیە، گزی، تەڵەکەبازی، دەغەڵ. |
| زغلول - طفل | Baby = infant | منداڵ. |
| زغلول الحمام - جوزل | Squab = dovelet | بێچوە کۆتر. |

| | | |
|---|---|---|
| زغلول = كرفس مائي | Water celery | كەرەوزی ئاوی. |
| زغليل - ادونيس صغير - دم النعمان | Adonis = Blister-wort = Cursed crow-foot | خوێنی نوعمان، گیایەکی کێویە گوڵی بچوك دەگرێت، لە گوڵاڵە دەچێت. |
| زغليلة = لبين المروج | Red pimpemel | شێرماری مێرگ، گیایەکی زیانبەخشە بە کشتوکاڵ گوڵی سووری مەیلەو شین دەگرێت. |
| زغنبج - زغبج - زيتون بري | Wild olive | راجع (زغنبج). |
| زغيم | Amadina = cut throat | (ئەمادینا)، جۆرە چۆلەکەیەکی بچوکە لە کۆمەڵەی گۆرەویلە. |
| زف | Ostrichs- feather , satiny | وردەپەڕ، پەڕی وشترمڕ. |
| زفان - زافن | Choreic | خورياوی، كورياوی، كەسێك تووشی نەخۆشی خوريا بووبێت. |
| زفة - موكب | Procession | کۆمەڵێك مرۆڤ بە شێنەیی بە سواری یان پیادەیی بۆ مەبەستێکی تایبەتی بڕۆن. |
| زفر - وسخ | Unclear = dirty | پیس. |
| زفر (للرائحة) | Bank = rancid | بۆدڕن. |
| زفزافة - زفزف - زفزاف | High wind = moderate-Breezo | ڕەشەبای بەردەوام، جۆرەبایەکە خێراییەکەی (٦)م لە چرکەیەکدا. |
| زفت - قار -قير | Pitch = asphalt | زفت، قیر، ئەسفەلت. |
| زفتي = مزفت | Piceous | قیراوی، هەر شتێك قیراویی بووبێت. |
| زفر | Prop | کۆڵەکە بۆ ڕوەك و درەختی بچوك. |
| زفرين الجرد - نبق مترادف - زفرين النباتي - عود الخير | Barren- privet = alaternus = itallan buck thorn | داری خێر، جۆرێکە لە درەختی تاوك پەرەکەی چەشنی نۆکێکە خڕو سورە ئنجا ڕەش دەبێت، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| زفن - تعريشة | Arbor = arbour | کەپر بۆ مێوو گوڵی هەڵو. |
| زفن - كوريا - خوريا = مرض الرقص السنجي - رقص سانت ويتس | Chorea , saint Vitus-dance | (کۆریا)، (خۆریا)، جۆرە نەخۆشیەکە لە ماخۆلان دەچێت. |
| زفير | Expiration, exhalation | هەناسەدانەوە. |
| زفير - نرجس نسيمي | Zephyrlily | نێرگزی شنە، جۆرێکە لە نێرگز. |
| زفيران | Zephiran | (زیفیران)، مادەیەکی میکرۆبکوژ و پاکژکەرەوەیە. |
| زفير | Zephyr | (زەفیر)، قوماشێکی تەنکە. |
| زق الماء = قربة | Water- skin | (کونگە)، خێکە، هەمانە، هەمبانە، هیز، مەشکە. |
| زق | Ascus | تورەکە، کیسە. |
| زق - تسمين | To fatten, cramming = stuffing | قەڵەوکردن. |
| زقاء - زقو | Cry of the bird | زیقەزیق- قوقەقوق. |
| زقاق البحر | Ascidian | جۆرە گیاندارێکی ئاویی نەرمە. |
| زقاق بحري | Fiord | خەڵەند، نزلێکی تەسکی باریك ئاوی پیادا بڕوات لە قەراغ چیا یان زەوی دا. |
| زقاق | Alley , lane | کۆڵان، کوچە. |

| | | |
|---|---|---|
| زقب - تغريد - شدو - صداح | Singing = warbling | خوێندنی باڵندە. |
| زقة - زقق - زقي | Darter, snake bird | باڵندەی ماریی، باڵندەیەکی ئاوی مل درێژە لە مەسینە دەچێت خۆی مت دەکا تا دەچن بیگرن ئەوساکە خێرا خۆی نوقم دەکات لە ئاوەکەدا ملی پێچاو پێچ دەکات. |
| زقزاق - زقزق - قطقاط | Plover, dotterel | توتراوسک، تیتلەپیچاخ، زیقاوڵە حەسەنە سیس، تیتڕواسک، جۆرە باڵندەیەکە خێرا رادەکات سەر باڵی رەشە ملی باریکە بەقەدەر کۆترێک دەبێ، لە گوێ ئاودا دەژی. |
| زقزاق شامي = ابو طيط | Lapwing, pewit = green plover | زیقاوڵەی شامی، باڵندەیەکە لە تەنکاو و قەراغ ڕوباردا دەژی سەرو پشتی مەیلەو شین و سەوزە سك و سنگی سپیە دو پەڕ وا بە سەریەوە. |
| زقزاق امريكي | Kill deer | زیقاوڵەی ئەمریکی. |
| زقزاق مصري | Spur- winged-plover | زیقاوڵەی میسری. |
| زقزقة | To warble = to peep = chirp | جیقە، جروکە، جیکەجیك، زیقەزیق، جریوە، جریکە، جریواندن، جریوە جریو. |
| زقفونة | Pick-a-back | قەلان دۆشکان، شان و پشت. |
| زقزوق - زمر = زمير | Stickle- back | ماسییە زوڕنا، جۆرە ماسیەکە کلکی لە زوڕنا دەچێت، درکێکی دەربەریو وا بەسەر پشتییەوە. |
| زقلية - هراوة | Club | کوتەك. |
| زقمة - طاعون | Plague, pestilence | سندان، تاعون، ژەقنە، ژەقنەبوت، ژەقنەموت، جۆرە نەخۆشییەکی ترسناکی درمە. |
| زقنبوت - ناصعة خنفساء ذهبية - نافخة البقر | Golden-beetle = buprestid | قالۆنچەی زێڕین، قالۆنچەی ئاڵتونی، جۆرە مێش و مەگەزێکی سوری مەیلەو زەردە ئەگەر ئاژاڵ لەگەڵ گیادا بیخوات بای پێ دەکات. هەروەها قەدی درەخت کون دەکات و زیانی پێ دەگەیەنێت. |
| زقوم | Deadly food | قوزەڵقورت، هەر خواردنێك کوشندەبێت. |
| زقوم - زکون = زکوم - هلج = بلح الصحراء | Zachum oil - tree = balanites = egyptian- balsam = thorn tree | زولفنج، هەلیلە، دەوەنێکی درکاوی ناوچە گەرمەکانە بەرەکەی لە زەیتون دەچێت بەکاڵی تفت و ڕەوان کەرە کە پێ دەگات شیرین دەبێت دەخورێت، گەڵاکەی بۆ مەبەستی سارێژکردنی برین و ئازاری جومگە، دەنکەکەی ڕۆنی لێ دەردەهێنرێت بۆ بەکارهێنان. |
| زقيقية = تفاحي | Linnet | زیقزیقە، جۆرە باڵندەیەکە، ڕەنگەکەی مەیلە و سوورە . |
| زقيات | Tunicata = ascidians | تورمەکییەکان ، مەشکەییەکان کۆمەڵە گیاندارێکن لەشیان بە پەردەیەك داپۆشراوە دوو کونی تیایە لە پێشەوە و لە پشتەوە. |
| زقيات - فطريات زقية | Ascomycetes | قارچکە تورمەکیی، جۆرێکە لە کەڕو یان قارچك تۆوەکەی لە ناو تورمەکەدا پەیدا دەبێت. |
| زقيم - حي العالم المائي = خس الماء | Water- lettuce | کاهوی ئاوی، ڕوەکێکە لە ئەستێرە دەچێت لە کۆمەڵەی سێوی بن ئەرز بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| زك - زغلول الحمام = جوزل | Squab = dovelet | بێچوە کۆتر. |
| زكام - زكمة - رشح | Cold = catarrh = coryza = rhcum | ئارسم، پەسیو، هەڵامەت، پەرسیف، پەرسیو. |
| زكام الغنم | Catarrh | ئوفە، سەقاو، مەقاو، مقاو، مرخە، پسکە، پزو، هەڵامەتی ئاژەڵ. |
| زكبة | Sperm of insect | مادەی نێری مێرو. |
| زكزاك | Zigzag | زیکزاك، پێچاو پێچ. |
| زكزكة = دغدغة | To tickle | ختوکە، قدیلانە. |

| | | |
|---|---|---|
| زهرة الغربيون | Spurge = Milk wort | شیرمار، گیایەکە شیراویک لەقەدو لقەکانی دا هەیە گوڵەکەی زەردە. |
| زهـرة السـابوناريا - الصابونيـة المخزنية - عرق الحلاوة | Saponaria = Soap wort | گوڵە سابون، ڕەگ و گەڵاکەی ئاوکێکی تیادایە لە جیاتی سابون بەکاردێت گوڵەکەی پەمبەیییە لە مێخەک دەچێت. |
| زهرة خاتم سليمان - ختم سليمان | Polygonatum = Solomons seal | ئەموستیلەی سلێمان، مۆری سلێمان، گوڵەکەی لە شێوەی زەنگوڵەدایە بە ڕەنگی سپی و سەوز. |
| زهرة زنبق النهار - فتنة النهار | Day lily | زەمبقی ڕۆژ، گوڵەکەی بە زۆری زەرد هەندێک جار پرتەقاڵی یان سور یان مێخەکیە. |
| زهرة القطيفة = (القديفة) | French- marigold | شەست پـەڕ، گیایـەکی هاوینەیـە گوڵەکـەی پەڵەپەڵـەی سـوری تێدایـە گەڵاکانی سەوزی تێرو بۆن خۆشن لە شێوەی ڕمـدان گوڵـەکانی زەرد یـا پرتەقاڵین و پەڵەی سوریان تێدایە. |
| زهرة الزينيا | Zinnia = youth and old age | (زینیا)، ئەستەمبولی، گوڵی یـەنگی دنیا، ڕووەکێکی سـاڵانەیە قەدەکـەی قیتە گەڵاکانی هێلکەی و زبرن گوڵەکانی بەشێوەی تاکن بەڕەنگی سـورو زەرد و پرتەقاڵی و سپی و پەمەی و بنەوشەی و ئەرخەوانی. |
| زهـرة الحـوض = حوضيـة = انقولية - حلقة المحبوب | Aquilegia = columbines | ئەڵقەی ئازیز، ئەڵقەی دڵدار، گوڵێکە لە کۆمەڵەی گوڵاڵە. |
| زهرة نعناع القط | Cat mint | نەعنا پشیلە، گیایەکە گەڵاکەی بۆنخۆشە گوڵەکەی مۆرە. |
| زهـرة الفاوانيـا، عود الصليب | Paeony, paeonia | (فاوانیا)، (پایونی)، گیایەکی زۆر بەسودە گوڵەکەی پەمبەییە. |
| زهـرة الشـوبر البحريـة الايلكـس البحرية - البهش البحرية | Sea holly = sea-llex | (ئیلکس) دەریا، ڕووەکێکـە لـە کەرەتەشـی دەچێـت گەڵاکـەی دڕکاویيـە گوڵەکەی تۆزی و شینە. |
| زهرة الهوشيرة المدماة | Coral bells | زەنگی شیلانی، گوڵەکەی سوری شیلانیە. |
| زهرة حشيشة الحمى عود القرح = التاغندست | Pyrethrum = pellitory = fever few | گیا تا، گیایەکە لە بەیبون دەچێت گوڵەکەی مێخەکی یان سور یان سپییە. |
| زهـرة لسان الحمـل - آذان الجـدي - موز الجنة | Plantain | زمانە بەرخ، گوێ کارژۆڵە، مۆزی بەهەشت. |
| زهرة الزعتر | Thyme | جاترە، گوڵەکەی پەمبەییە. |
| زهرة حشيشة العطاس | Sneezeweed | گیا پشمین، گوڵەکەی پرتەقاڵیە. |
| زهرة حسن يوسف | Sweet- william | حوسـنی یوسـف، جۆرێکـە لـە مێخـەک سـاڵێک یـاخود دوو سـاڵ دەژی گوڵەکـەی وردە بەشـێوەی هێشـوی سـور یـان سـپی یـان پەمـەی یـان ئەرخەوانی، ڕیشاڵێکی زۆری پێوەیە. |
| زهرة القرنفل الصيني | China- pink | مێخەکی چینی، گوڵەکانی بەشێوەی هێشون هەندێ جاریش بە ڕەنگـی سورو پەمەی. |
| زهرة سهام الحب | Love spear = Love arrow | تیری ئەوین، تیری عەشق، ڕوەکێکی تەمەن درێژە گەڵاکانی لە شێوەی ڕم دان توکیان پێوەیە گوڵەکانی بەشێوەی هێشوی شین یا سپین. |
| زهـرة الـداودي (أبو الطوبة) | Garden- chrysanthemum | داودی تۆپزی، پێشی دەوترێ گوڵی (ڕۆژهەڵات) گەڵاکانی سوك و شۆڕن گوڵەکانی ئاوێتەن تەمەنی درێژە گەلێك ڕەنگی هەیە. |
| زهرة البرغاموت | Bergamot | (بێرگاموت)، ڕوەکێکی بۆنخۆشە گوڵی سورو لەیلاقی و مێخەکی و سپی دەگرێت. |
| زهرة لسان الايل | Harts tongue | زمانە ئاسك، گیایەکە گوڵی جوان دەگرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| زهرة الخصب - اطوقة | Eutoca | گوڵه ئیوتۆکه، گوڵه پیت ڕووەکێکە گوڵێکی زۆر دەگرێت واتە بەپیتە. |
| زهرة الجنطيانا | Gentian | (جنتیان)، گەڵاکەی باریکە گوڵەکەی لەشێوەی ڕەحەتیدایە شینە. |
| زهرة الغلتونيا | Galtonia | (گالتۆنیا)، گیایەکە قەدی قیتی درێژی هەیە گوڵی سپی دەگرێت لەشێوەی زەنگۆڵەدا. |
| زهرة الارطماسيا = حبق الراعي - شويلاء | Artemesia | ئەرتمیزیا، گیایەکە گەڵاکەی بۆنخۆشە. |
| زهرة الشيخ - شيخة | Groundsel | گوڵە شێخانی، گوڵێکەزار، گوڵی زەرد دەگرێت. |
| زهرة زنبقة الوادي | Lily of the valley | زەمەقی دۆڵ، گوڵی سپی دەگرێت. |
| زهرة الصريمة | Honey suckle | هەنگوین مژە، شیلە مژە، دەوەنێکە گوڵەکەی شیلەی زۆرە. |
| زهرة القرنفل | Carnation clove- pink = pink | گوڵە مێخەک، تەمەنی درێژە گوڵەکانی جوانن و بۆنێکی عەتریان هەیە قەدەکەی ڕەق و گرێ گرێیە گەڵاکانی بەرامبەر یەکن و درێژکۆڵەن گەڵا ڕەنگی هەیە وەکو سپی و سوور پەمەی. |
| زهرة الحبق | Veronica | ڕێحانە، ڕەیحانە، ڕووەکێکی گیاییە گەڵا زۆر دەکات گەڵاکانی سادەو بەرامبەر یەکن گوڵەکانی مۆرن و بەشێوەی هێشو بەرز دەبنەوە. |
| زهرة عين البزون | Madagas car perwinkle = Vinca | چاوە پشیلە، گیایەکی تەمەن درێژی قیتە گەڵاکانی بەرامبەر یەکن و سەوزی تێرن گوڵەکانی پێنج پەلکیان هەیە بەرەنگی پەمەی و سپی. |
| زهرة القمر | Calonyction | گوڵە مانگ، ڕووەکێکی خۆ هەڵواسەرە بەسەرما زوو دەفەوتێ نزیکەی دوانزە مەتر بەرز دەبێتەوە گوڵێکی سپی ئاوریشمی هەیە لە ئێواران دا دەم دەکاتەوە بۆ پەرژین دەست دەدات. |
| زهرة الديزى = زهرة الدكمة | English- daisy | (دیزی)، گوڵە دوگمە، گیایەکی زۆر کورتە گەڵاکانی وەك کەوچك وان نزیك ڕەگەکەن گوڵەکانی وەك هێشون و خڕن بە ڕەنگی سوور و سپی و پەمەی. |
| زهرة العطاس = خانق الفهد - ارنيكا | Mountain- tobaco = Arnica | توتنی شاخی، یۆز خنکێن، گوڵەپشمین، گیایەکی کێوی پزیشکیە گوڵەکەی زەردە، دەرمانێکی لێ دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی کوترلوی ئێسك. |
| زهرة الشمع، هوية | Wax flower hoya = wax plant | گوڵە مۆم، دەوەنێکی هەمیشە سەوزە گەڵاکەی هێلکەی و ئەستورە گوڵەکەی ئەستێرەییە وەکو مۆماوی بێت وایە. بازنەیەکی سوری تیادایە، بۆ ڕازاندنەوە بەکاردێت. |
| زهرة خف السيدة | Ladys slipper = Garden balsam | سۆڵی خانم، گەڵاکەی سەوزە پەڵەی شینی تیادایە لاسکی گوڵەکەی درێژە گوڵەکەی ڕەنگینە بە سپی و سەوز. |
| زهرة الغلوكسينيا الجلوكسينيا | Gloxinia | (گلوکسینیا)، گیایەکە گوڵەکەی لە زوڕنا دەچێت ڕەنگەکەی سوری هەناریە. |
| زهرة الازاليا - وردية | Azalea = Rhododendron | (ئەزالیا)، گوڵەکەی زەرد یان پەمبەییە لە شێوەی بۆڕیدایە. |
| زهرة السلطان | Sultan flower | گوڵە سوڵتان، گیایەکە گوڵی ئەرخەوانی یان زەردی بۆنخۆش دەگرێت. |
| زهرة لاتمسني | Impatiens = Touch me not | گوڵە دەستم لێ مەدە، جۆرە گیایەکە ئەگەر دەست بدەیت لەبەرەکەی لول دەبێت و تۆوەکەی دەوەرێنێت. |
| زهرة الاكليل - دفنة وردية - غار وردى | Rose daphne = garland flower | گوڵە گوڵبەند، دەوەنێکی هەمیشە سەوزە هێشوە گوڵی ئەرخەوانی دەگرێت. |
| زهرة دوتزيا | Deutzia | (دۆتزیا)، دەوەنێکە هێشوە گوڵی سپی دەگرێت. |
| زهرة جنستا | Genista | (جنستا)، دەوەنێکە گوڵی جوان دەگرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| زهرة الثلج - زرنبوك | Snow- drop | گوڵە بەفر، جۆرە درەختێکە لە ڕەگەزی زەیتون گوڵی سپی دەگرێت. |
| زهرة الذهب، زهرة الداودي - اقحوان | Chrysanthe- mum | گوڵە داودی، ڕووەکێکی تەمەن درێژ یان ساڵانەیە گوڵی سپی یان زەرد یان مۆر دەگرێت. |
| زهرة الكالونا | Calluna | کالونا، ڕوەکێکە گوڵەکەی بەشێوەی هێشویەکی قیتی درێژی پەمبەیە. |
| زهرة الكاميليا | Camellia | (کامیلیا)، دەوەنێکە گوڵی پەمبەی دەگرێت. |
| زهرة العنق - عنقية | Throat wort = trachelium | گوڵە مل، ملۆکە، گیایەکە بۆری پەڕەی گوڵەکەی درێژە وەکوو مل وایە هەندێك جۆری گوڵی شین دەگرێت. |
| زهرة العناق - عناقية - ونكا | Periwinkle, Vinca | ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی ژاڵە، گوڵی جوان دەگرێت بۆ ڕازاندنەوە لە باخچەکاندا دەڕوێنرێت. |
| زهرة الكولشيك = زهرة الغولة | Colchicum, Meadow-saffron | زەعفەرانی مێرگ، گیایەکە گوڵی جوان دەگرێت. |
| زهرة الدم | Hemanthus = Blood flower | گوڵە خوێن، لە هەندێك جۆری مادەی ژەهرین دەردەهێنرێت. |
| زهرة النجمة | Carrion flower | گوڵە ئەستێرە، ڕوەکێکی ئاوکداری بێ گەڵاو بێ درکە گوڵەکەی ئەستێرەیی و بنەوشەی و بۆگەنە. |
| زهرة الاطلس | Satin flower | گوڵە ئەتڵەس، گوڵە ساتان. |
| زهرة قمرية | Honesty | گیایەکە گوڵی ئەرخەوانی گەورە دەگرێت. |
| زهرة ينكي دنيا البرتقالية | Orange- zinnia | یەنگی دونیای پرتەقاڵی. |
| زهرة البرتقال - قداح | Orange- blossom | گوڵەپرتەقاڵ. |
| زهرة الكشتبان = ديجيتال - قمعية | Digitalis | گوڵە ئەنگوستیلە، گوڵە ڕەحەتی، ڕوەکێکی پزیشکیە گوڵەکەی ئەرخەوانیە لە زەنگۆڵە دەچێت دەرمانی (دیجیتال)ی لێ دەردەهێنرێت کە بۆ نەخۆشی دڵ بەکاردێت. |
| زهرة القناع | Alonsoa = Mask flower | گوڵە دەماخ، گوڵە کلێتە. |
| زهرة الغراب = حوذان | Crow flower = butter cup | گوڵە قەلەڕەشکە، جۆرێکە لە گوڵاڵە سورە. |
| زهرة النسيم - زهرة الهواء | Air- flower | گوڵە هەوا، گوڵە شنە، گیایەکە گوڵێکی سەیر دەگرێت. |
| زهرة مريم - قطرم بنفسجي | Violet- catmint | گوڵە مریەم، گیایەکی بۆن خۆشە گوڵی سپی مەیلەو شین دەگرێت. |
| زهرة الترس - اندروزاس - كسلح | Sea navel- wort = Androsace | (ئەندرۆسیس) ناوکی دەریا، گیایەکی سەلکداری پزیشکیە. |
| زهره الجرب - سكابيوزا - جربيه | Scabiosa | (سکابیۆسا)، گوڵە گەری، جۆرە گیاو دەوەنێکە گوڵە ئەرخەوانی جوان دەگرێت بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت، جاران بۆ چارەکردنی گەڕیی بەکاردەهات. |
| زهرة الجنة - رنف الملوك | Heaven flower = Paradise- flower | گوڵە بەهەشتی، دەوەنێکە گوڵی جوان دەگرێت. |
| زهرة الحجر - جوز جندم | Mangosteen- tree | گوڵە بەرد، گوێز گەنم درەختێکە بەرێکی بۆن خۆش دەگرێت دەخورێت. |
| زهرة الرمال - ارنارية | Sand wort, Arenaria | (ئەریناریا)، گوڵە لم، گیایەکی کێویە لە کۆمەڵەی مێخەك گوڵی بچوکی پەمەیی دەگرێت. |
| زهرة السبيل - سبيلية | Callirhoe | گوڵە ڕێگە جۆرە گوڵێکە لە کۆمەڵەی تۆڵەکە. |
| زهرة المساء - جوليانا | Sweet rocket | (جولیانا)، کوزەڵەی شیرین، گیایەکە گوڵی گەورەی شین یان بنەوشەی دەگرێت ئێواران بۆنە خۆشەکەی بڵاودەبێتەوە |

| | | |
|---|---|---|
| زهرة الشمس - مداهين | Sun rose | گوڵە خۆر، گوڵەکەی بەشێوەی هێشویەکی زەردە. |
| زهرة شارون | Rose of sharon = Aarons beard | گوڵە شارون، گیایەکە گەڵاکەی هەمیشە سەوزەو گوڵەکەی زەردە. |
| زهرة المشتري | Jupiter -flower = Lychins | گوڵی جوپیتەر، گیایەکی توکنە لە کۆمەڵەی مێخەک گوڵەکەی سورە. |
| زهرة العنكبوت | Spiders- wort = phalangium- ramosum | گوڵە جاڵجاڵۆکە، جۆرێکە لە شلێر گوڵەکەی پەمبەییە دەرمانی لێ دەردەهێنرێت بۆ مێز پێ کردن و چارەکردنی گەستنی مێروو جاڵجاڵۆکە. |
| زهرة برية | | راجع (زهره النسرين). |
| زهرة الريح = شقائق | Anemone- wind- flower | گوڵاڵە، گوڵاڵە سورە. |
| زهرة الالام = زهرة الساعة - زهـــرة الاشـــجان = زهـــرة باسيون - ورد الساعة | Passion- flower = passiflora | گوڵە ئازار، گوڵە ئێش، گوڵە سەعاتی، ڕوەکێکی جوانی کەپرییە گوڵەکەی بە زۆری شینە، دەرمانێکە بۆ نەخۆشی فێ، لە سەعات دەچێت. |
| زهرة السلحفاة | Chelone | گوڵە کیسەڵ، شێوەی گوڵەکەی لە پێش پشکوتندا لە کیسەڵ دەچێت. |
| زهرية = مزهرية | Flower- vase | گوڵدان. |
| زهريات | Anthozoa | گوڵاڵەکان، کۆمەڵە گیاندارێکی دەریایە بریتیە لە شیلان و گوڵاڵەی دەریا. |
| زهري | Floral | گوڵی، شتێك پەیوەندی هەبێت بە گوڵەوە. |
| زهري - سلفس = مرض الافرنجي | Syphilis | نەخۆشی فەرەنگی، ئاتەشەك، نەخۆشیەکی درمە بەهۆی دەست لێدان و جوت گرتنەوە بڵاو دەبێتەوەو برینی پیس لەسەر پێست پەیدا دەکات. |
| زهري خلقي | Congenital syphilis | فەرەنگی زگماکی. |
| زهراء = سوني | Stienbock = soni | (سونی)، مانگا کێوی. |
| زهم - سنخ = زنخ | Rancidity | بۆگەن، بۆدڕن. |
| زهم | Sebum | ماددەیەکی چەورە لوی (گلاندلا) چەوریدەری دەدات لە پێستدا. |
| زهم - زهومة | Fetidness | بۆگەنی، بۆ دڕنی. |
| زهو | Vanity = Vainglory | لە خۆ بای بون. |
| زهيد | Little = small | کەم. |
| زهير | Polyanthous | گوڵزار، گوڵستان، گوڵەجاڕ شوێنێك کە گوڵی زۆر بێت. |
| زهيرة - زهرة صغيرة | Floret | گوڵێك، گوڵوکە، گوڵێکی بچوك. |
| زوان - زوان - زيـــوان - شيلم - رنقـة - بـهمى - رويطة - خيطة = جاودار | Darnel, Damelo = tare = Rye grass = Lolium | زیزانە، بیلیلك، ئومەسلا، زیوان، شێلمۆگ، گیاڕوتە، گیا شیلە، هەرزنە کێویلە، کاڵتاس، گیابریش، مرۆر، ولیرە، خولیرە، خلێرە، دەغەل، شەلەمە، چەودەر، زیوان، دنێب، گیایەکە لە ناو گەنم دا دەڕوێت بەرەکەی لە گەنم بچوکترە ئاڵە ئەگەر یەکێك بیخوات خەوی لێ دەکەوێت. |
| زوان معمر = نسيلة | Red darnel | زیوانی سور، زیزانەی سور. |
| زواج | Marriage | ژن هێنان، شوکردن. |
| زوافر | Foundation- stone | بەردی بناغە. |
| زواق - بهرج - بهرجان | Tinsel | فستۆ، ئۆیە، دانتێل، ئەشرە، هەر دەزویەك یان شریتێکی کانزای یان کاغەز یان پلاستیکی بریسکەدار کە قوماش و ناو ماڵی پێ برازێنرێتەوە. |
| زوال | Cessation = vanishment = disappearance | نەمان، لاچون، تێپەڕ بون. |
| زوال | Transit | تێپەڕبونی تەنێکی ئاسمانی بەسەر هێڵی نیوەڕۆی شوێنێکدا. |

| | | |
|---|---|---|
| زوال الشمس | Sunset | خۆر ئاوا بون، ئاوابونی خۆر. |
| زوال لون الشعر | Achromot- richia | نەمانی ڕەنگی قژ |
| زوار الهنـد = سـنونو = خطـاف ، عصفور الجنة | Swallow | پەرەسێلکە، جۆرە باڵندەیەکی ڕەشە کلکی سێ پەلکە. |
| زوال مغناطيسي = خط الزوال المغناطيسي | Magnetic- meridian | نەمانی موقناتیسی، لاچونی موقناتیسی. |
| زوباغ = ندغ = زعتر بري | Saturela- monlana = wild thyme | جاترە کێویلە، گیایەکی پزیشکیە گوڵی پەمبەی دەگرێت. |
| زوبعة = اعصار = اعصار حلزوني | Whirl wind = Hurricane = cyclone = Tornado | بۆران، تۆف، باپیلیسک، گێژەڵوکە، خێرایی‌یەکەی نزیکەی (٦٨) میل دەبێت لە کاتژمێرێک دا خانو دەروخێنێت. |
| زوبعة | Squall | گێژەڵووکە، بایەکە لە پڕێکا هەڵدەکات و لە پڕێکا نامێنێت. |
| زوبعة ثلجية | Snow storm = Hail storm | زریان، بایەک بە بەفرەوە بێت. |
| زوبعة برية أو بحرية عاصفة | Tempest | ڕەشەبا. |
| زوبعة رعدية = عاصفة رعدية | Thunder- gust = Thunder storm | گێژەڵوکە یان ڕەشەبا بە هەورە تریشقەوە. |
| زوبعة مغناطيسية | Magnetic- storm | ڕەشەبای موقناتیسی، گێژەڵوکەی موقناتیسی. |
| زوبعة باغويو | Baguio storm | گێژەڵوکەی باگیو، جۆرە گێژەڵوکەیەکە لە دورگەکانی فیلیپیندا ڕوودەدات. |
| زوبعة ترابية | Sandy cyclone = Dust storm | گێژەڵوکە، گەردەلول، جۆرە ڕەشەبایەکی تەپوتۆزاوی‌یە. |
| زوج متوحد = زوج منعزل | Lone pair | جوتەی گۆشەگیر، جوتێک ئەلیکترۆن لە مۆلیکیولێک (گەرد) دا بەشداری یان نەکردوە لە دوو ئەتۆمەکە (گەردیلە)دا: واتە هیچ ڕۆڵێکیان نیە لە کرداری بەنداندندا. |
| زوج = قرين | Husband | پیاو، مێرد. |
| زوج | Pair = couple | جوت، جفت. |
| زوج = وليف | Mate | ئاشقەو ماشقە، دەنك. |
| زوجة = قرينة | Wife | ژنی مێردار، ژن، هاوسەر، خێزان. |
| زوجة اب | Stepmother | باوەژن، زرداك. |
| زوجة عجر | Old wife | پیرێژنە ماسی، جۆرە ماسیەکی دەریایی‌یە. |
| زوجي | Evernumber | جوتە، جوتەی. |
| زوجـي الاصـابع = مزدوجة الاصابع | Artiodactyla | گیاندارە جوت پەنجەیی‌یەکان، جۆرێکە لە گیاندارە شیردەرە جوت سمەکان وەکو گاو وشتر. |
| زور = صلق | Throat | قورگ، گەرو. |
| زور = صدر | Breast = thorax | سنگ، سینە. |
| زورق | Boat = Scapha, Scaphium = Skiff = canoe | بەلەم، ناوە، قەیاغ. |
| زورق مسلح | Armed boat | بەلەمی چەکدار. |
| زورق بخاري سريع | Speed boat | بەلەمی هەڵمی خێرا. |
| زورق بخاري | Steam launch | بەلەمی هەڵمی، ماتۆڕی ئاوی. |
| زورق موتوري | Motor boat | بەلەمی ماتۆڕی. |

| | | |
|---|---|---|
| زورق شراعي | Schooner | بەلەمی چارۆکەدار. |
| زورقية القدم | Scaphopoda | گیانداری پـێ بەلەمی‌یـەکان، کۆمەڵێکـە لـە گیـانداره نەرمـەکان وەکـو گیانداری دینتالیۆم کە سەدەفەکەی دەچێت . |
| زورقيات | Novicula | بەلەمی‌یـەکان، ڕەگەزێکـە لـە گیـانداره دیاتۆمـەکان خانـەکانیان لەشـێوەی بەلەمدان. |
| زورقي | Scaphoid | بەلەمی. |
| زورقي - عظم زورقي | Scaphoid- bone | ئێسکی بەلەمی لەلەشدا . |
| زورقية - شجرة الزورق | Angophpra | داربەلەم، درەختێکە لە کۆمەڵەی مۆرد بۆ ڕازاندنـەوە بەرەکـەی لـە بەلـەم دەچێت. |
| زوريل - ابو عفن - زورلة | Zoril = zorrilla | (زۆریل)، بۆگەنکە، جۆرێکە لە مشکی خورما، گیاندارێکە شلەیەکی بۆگەن دەپرژێنێت بۆ دورخستنەوەی دوژمن لـە خۆی پێستـەکەی هێڵـی ڕەش و قاوەی و زەردی تیادایە. |
| زوستيرا | Zostera | (زوستیرا) ڕوەکێکی دەریای‌یە لەوەڕێکی باشە بۆ ماسی. |
| زوسبور - بوغ حيواني | Zoospore | (زوسپۆر)، سپۆری جولاّوە. |
| زوعة - شريحة | Slice | قاش، کوز، کویزی. |
| زوغ | Deviate | لادان لە ڕێم یاخود بار یا نەژاد یا پێوانە. |
| زوغ - زوغان | Aberration | لادان، پەیدابونی وێنەیەکی ناڕێك بەهۆی زەرەبینێکەوە کە تیشکۆکەی ڕێك و پێك نەبێت. |
| زوغ ضوئي | Aberration of light | لادانی ڕووناکی. |
| زوغ لوني - زيغ لوني | Chromatic = aberration | لادانی‌ڕەنگی، لێڵ ڕەنگی. |
| زوغان كروى - زيغ كروى | Spherical = aberration | لادانی خڕیی، لێڵ گۆیی. |
| زوف - زوف الطائر | Taxying | باڵ فش کردن، باڵ کردنەوەو ڕۆیشتنی باڵندە بەسەر زەوی‌دا. |
| زوفــا - زوفــاء - زوفي = حل - اشنان داود | Common- hyssop | ئەسپۆنی داود، ڕوەکێکی گیای کێویە قەدەکـەی باریك و چـوار گۆشـەیە گەڵاکەی لە گەڵای جاترە دەچێت دەکوڵێنرێ و دەخورێ بۆ کۆکە و بەڵغەم باشە گەڵاکەی بۆن خۆش و تاڵە گوڵەکەی شینە. |
| زوفيت | Zoophyte | (زوفایت)، گیاندارێکی نا بڕبڕەدارە لە ڕووەك دەچێت وەکو ئیسفەنج و شیلان. |
| زولو | Zulu | (زولو)، جۆرێکە لە مانگای کێوی. |
| زولو | Zulu | (زولو)، جۆرێکن لە قەلەڕەش. |
| زولية | Carpet = Rug | فەرش، قاڵی، زیلو. |
| زوليت - زيولايت | Zeolite | (زیولیت)، جۆرە بەردێکە بریتی‌یە لە سلیکاتی ئەلەمنیۆم و یان سۆدیۆم یان کالسیۆم بۆ پاکردنەوەی ئاوی ناساز و هەڵمژینی گازو ووشك کردنـەوە بەکاردێت. بـە ئاسـانی ئـاوی بلـووری وون دەکـات و بـە گـەرم کـردن بـۆ پلەیـەکی بـەرز وەری دەگرێتـەوە هـەروەها توانـای ئـاڵو گـۆڕ کردنـی ئایۆنەکانی هەیە. |
| زولوجي - علم الحيوان | Zoology | (زولۆجی)، زانیاری گیاندارەکان. |
| زولوجية زراعية = علم الحيوان الزراعي | Agricultaral = Zoology | زانیاری گیاندارە ماڵیەکان و کشتوکاڵیەکان. |
| زوم - نسغ | Sap = Juice | ئاوك- ئاوکی ڕوەك. |

| | | |
|---|---|---|
| زويسايت - زوسيت - زويسيت | Zoisite = Tanzanite | (زويسايت)، زويسيت بەردێكی بەنرخە ڕەنگەكەی پەمبەییە لە وڵاتی تانزانیادا هەیە، بریتیە لە سلیكاتی كالسیۆم و ئەلەمنیۆمی ئاوی. |
| زويقة | Court- card = Face- card | كاغەزی قوماری وێنەدار. |
| زي | Wear = Fashion = Dress | جل وبەرگ، پۆشاك، پۆشەنی. |
| زيات | Oil seller | ڕۆن فرۆش. |
| زيادة | Increase = Extra | زۆری، زیادی، پەرە، پتری. |
| زيادة الاسنان = ثعل | Polydentia | بونی ددانی زیادە لەناو دەمدا. |
| زيار | Barnacles = Twitch | لەواشە، گیرەی لوتی گیاندار. |
| زيادة سنوية - نمو سنوي | Annual increment | گەورەبوون یان زیادبوون لە ماوەی ساڵێكدا. |
| زيادة الارجل | Polyscelia | بونی قاچی زیادە. |
| زيادة كريات الدم البيضاء | Leucocy to sis | زۆربوونی ژمارەی خڕۆكە سپییەكانی خوێن. |
| زيارة | Visit | سەردان، چونە میوانی. |
| زيانة - عشبة هندية | Indian- sarsaparilla | (سارساپاریلای) هیندی، دەوەنێكی كەپری پزیشكیە. |
| زيبو | Zebu | (زیبو)، مانگایەكی هیندی دوگدارە. |
| زيبق | | راجع (زئبق). |
| زيت | Oil = oleum | ڕۆنی شل، چەوری شل، هەر ماددەیەكی شل كە بسوتێت و لە لەشی ڕوەك یان گیاندار دەربهێنرێت بۆ مەبەستی خواردن یان ڕوناك كردنەوە یان پزیشكی بەكاربێت. |
| زيت اللوز المر = بنز الديهايد | Benzaldehyde = oil of bitter- almond | ڕۆنی بادەمی تاڵ. |
| زيت الكاد - زيت العرعر | Oil of cade = Cade oil = Juniper oil | ڕۆنی كاد، ڕۆنێكە لە قەتران دەچێت لە داری هەڤریسك دەردەهێنرێت، لە دروست كردنی دەرمانی چارەكردنی نەخۆشی پێستدا (وەكو نەگزیما) بەكاردێت. |
| زيت البابونج | Oil of camomile | ڕۆنی بەیبون. |
| زيت الكرفس | Oil of celery | ڕۆنی كەرەوز. |
| زيت الزئبق | Gray oil | ڕۆنی جیوە، تێكەڵاوێكە لە ڕۆن زەیتون و لانۆلین (ڕۆنی خوری) و جیوە بۆ چارەكردنی نەخۆشی فەرەنگی بەكاردێت. |
| زيت جوز الهند | Coconut oil | ڕۆنی گوێزی هیند. |
| زيت الكزبرة | Oil of coriander | ڕۆنی گژنیژ، بۆ چارەكردنی باكردن بەكاردێت. |
| زيت حب الملوك | Croton oil | ڕۆنی شادەنك. |
| زيت الكبابة | Oil of cubebe | ڕۆنی كەبابە، بۆ میز پێ كردن باشە . |
| زيت الشبث | Oil of dill | ڕۆنی شویت، بۆ پاكژكردنەوە بەكاردێت. |
| زيت الزنجبيل | Oil of ginger | ڕۆنی زەنجەفیل، لە ڕەگی زەنجەفیل دەردەهێنرێت. |
| زيت شحم الخنزير | Lard oil | ڕۆنی بەراز. |
| زيت الخزامى - زيت اللاونطة | Oil of lavender | ڕۆنی لاوەنتە، بۆ وریاكردنەوەو دژی كۆڵنج بەكاردێت. |
| زيت جوز الطيب - زيت جوز بوا | Oil of mace = Oil of nutmeg | ڕۆنی گوێز بۆ. |
| زيت الليلك - زيت الليلج | Margosa oil | ڕۆنی لەیلاق، بۆ چارەكردنی گەڕی و گولی. |

| | | |
|---|---|---|
| زيت الابهل - زيت الصفينة | Oil of savin = Oil of sabine | ڕۆنی ساڤین، ڕۆنێکە لە گەڵای درەختی ساڤین (سابین) دەردەهێنرێت بۆ وریاکردنەوە بەکاردەهێنرێت. |
| زيت البردقوش = زيت المرزنجوش | Oil of marjoram | ڕۆنی بەردگوش، ڕۆنی بەرزنگوش، ڕۆنی مەرزنگوش، دەرمانی وریاکردنەوەو بارکردن و ئازار هێمن کەرەوەی لێ دەردەهێنرێت. |
| زيت النعناع | Oil of mint = Spearmint oil | ڕۆنی نەعنا، ئارەقی نەعنا بۆ چارەکردنی باکردن و وریا کردنەوەو میز پێ کردن باشە. |
| زيت الفلية | Oil of penny royal | ڕۆنی پونگە. ئارەقی بونگە، بۆ چارەکردنی باکردن و کەم کردنەوەی ئازار. |
| زيت الكراوية | Caraway oil | ڕۆنی کەراویە، بۆ چارەکردنی باکردن بەکاردێت. |
| زيت الزيتون - زيت حلو | Olive- oil | ڕۆن زەیتون. |
| زيت اللوز | Almond oil | ڕۆن بادەم. |
| زيت طيار | Volatile oil | ڕۆنی سوك، زوو دەبێت بە هەڵم. |
| زيت اليانسون - زيت الشمر | Anise oil = Funnel oil | ڕۆنی ڕازیانە |
| زيت التشحيم - زيت التزليق | Lubricating- oil = Grease = Lubric = Lube oil | ڕۆنی چەورکردن، (گریس)، بریتیە لە پەترۆل یان ڕۆن یان تێکەڵاوی هەردوکیان بۆ کەم کردنەوەی لێك خشان لە ئامرازو دەزگا کانزاییەکاندا واتە بۆ چەورکردنی تەوەرەی ئامرازەکان بەکاردێت. |
| زيت الخشخاش | Oil of poppy- seed | ڕۆنی تۆوی خاشخاش. |
| زيت الورد - عطر الورد | Oil of rose = Rhodinon | ڕۆنی گوڵەباخ، گوڵاو، ئارەقی گوڵ. |
| زيت الزاج | Oil of vitroil | ڕۆنی زاخ، ناوێکی کۆنە بۆ ترشی گۆگردیك (کبریتیك). |
| زيت الحجر = بترول = نفط طبيعي | Petroleum = Oil of rock = Rock oil | نەوتی سروشتی، پیترۆل، پەترۆل ڕۆنی بەرد. |
| زيت الصندل | Sandal oil | ڕۆنی سەنەل، لە داری سەنەل دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی نەخۆشی سوزەنەك بەکاردێت. |
| زيت تمبلين | Templin oil | ڕۆنی تەمپلین، جۆرێکە لە تەربنتینی سنەوبەر. |
| زيت السولار | Solar oil | ڕۆنی سۆلار، یەکێکە لە بەرهەمەکانی دڵۆپاندنی پەترۆل لە نێوانی پلەی گەرمیی (٢٠٠-٢٥٠)ی سەدیدا دەدڵۆپێت. |
| زيت الزقوم | Zachun oil | ڕۆنی هەلیلە لە تۆوی داری هەلیلە دەردەهێنرێت. |
| زيت التجميل | Adorment oil | ڕۆنی ئارایشت. |
| زيت البرجاموت = زيت البرغموت | Bergamot oil | ڕۆنی لیمۆی بێرگاموت، ڕۆنی لالەنگی. |
| زيت المفاصل | Synovia | ڕۆنی ناو جومگەی لەش. |
| زيت البان - زيت المورنجة | Ben oil = moringa oil | ڕۆنێکە لە گوشینی تۆوی درەختی (بان) یاخود (مۆرینجیا) دەردەهێنرێت بێ بۆن و بێ ڕەنگە بۆ چەورکردنی پارچەی مەکینە بەکاردێت. |
| زيت القسطورة | Axungia- castoris | ڕۆنی کاستۆر، ئەو ڕۆنەی کە لە تورەکەی ئاوگەڵی سەگڵاو دەردەهێنرێت. |
| زيت العظام | Bone oil | ڕۆنی ئێسقان، مادەیەکی چەورە لە دڵۆپاندنی ئێسقان لەشوێنێکی بەتاڵ لە هەوادا دەستگیر دەبێت، دەکرێتە ئەو ئەلکهولەوە کە بە شێوەی سوتەمەنی بەکاردێت. |
| زيت السمسم - سيرج - شيرج | Sesame oil | ڕۆنی کونجی، شیرە. |
| زيت خام | Crude oil | چەوری خاو، ڕۆنی خاو |

| | | |
|---|---|---|
| زيت الغاز - غازويل | Gas oil | گازۆیل، ڕۆنی گاز. |
| زيت نباتي | Oil | ڕۆنی ڕوەکی. |
| زيت حب الملوك | Croton oil | ڕۆنی دەنکی شا، ڕۆنی شادەنك، مادەیەکی ڕەوانکەری بەتینە. |
| زيت معدني | Mineral oil | ڕۆنی کانزای، ڕۆنی چەورکردن کە لە نەوتی خاو دەردەهێنرێت. |
| زيت السمك = زيت كبد الحوت | Cod- liver , Oil | ڕۆنی ماسی، ڕۆنی جگەری نەهەنگ، جۆرە چەوریەکە لە جگەری نەهەنگ یان ماسی دەردەهێنرێت دژی نەخۆشی ئێسکە نەرمە بەکاردێت پڕە لە ڤیتامین (أ، د). |
| زيت الحوت | Whale oil | ڕۆنی نەهەنگ، بۆ ڕوناك کردنەوە و دروست کردنی سابون بەکاردەهێنرێت. |
| زيت ثقيل | Heavy oil | ڕۆنی قورس، تێکەڵاوێکە لە نەفتالین و کریزۆنات، شلەیەکە لە ئەنجامی دڵۆپاندنی قەترانی خەڵوز دەستگیر دەبێت. |
| زيت جفوف = زيت جفيف | Drying oil | ڕۆنی ووشکەوە بوو، ئەو ڕۆنەی کە بە خستنە بەرهەوا زوو ووشك دەبێتەوە وەکو ڕۆنی کەتان. |
| زيت نصف جفيف - زيت نصف جفوف | Semidrying oil | ڕۆنی نیمچە ووشکەوە بوو. |
| زيت غير جفيف - زيت غير جفوف | Nondrying oil | ڕۆنی ووشکەوە نەبوو، ئەو ڕۆنەیە کە بە خستنە بەرهەوا ووشك نابێتەوە. |
| زيت حصا لبان ، زيت روزماري | Oil of rosemary | ڕۆنی ڕۆزماری، لە ڕووەکی ڕۆزماری دەردەهێنرێت. |
| زيت الحيمن، زيت العنبر | Sperm oil | ڕۆنی عەبەر، ڕۆنێکە لە سەری جۆرە نەهەنگێك دەردەهێنرێت پێی دەوترێت نەهەنگی عەبەر یان نەهەنگی سپێرم. |
| زيت العنبر = زيت الكهرمان الاصفر | Oil of amber = succinum- oil | ڕۆنی عەبەر، ڕۆنێکە لە کارەبای زەرد (مادەیەکی ڕاتنجیيە) دەردەهێنرێت مادەیەکی وریاکەرەوەیە دژی کۆڵنج بەکاردێت. |
| زيت الكارون | Carron oil | ڕۆنی کارۆن، تێکەڵاوێکە لە ڕۆنی کەتان و ئاوی قسل بۆ چارە کردنی سوتاوی بەکاردێت. |
| زيت قسطنهة | Castonha oil | ڕۆنی کاستۆنها، ڕۆنێکی بۆنخۆشە لە درەختی گوێزی بەرازیل دەردەهێنرێت. |
| زيت الشربين - زيت الارز | Cedar oil | ڕۆنی عەرعەر، ڕۆنی هەڤریسك ڕۆنێکی بۆنخۆشە. |
| زيت حشيشة البراغيث، زيت الاريغارون | Oil of erigeron = Fleabane oil | ڕۆنی ئەریگارۆن، ڕۆنێکی سوکەڵەیە زوو هەڵدەچێت. |
| زيت بتشولي | Oil of patchouli | ڕۆنی پاتشولی، ڕۆنێکە لە جۆرە نەعنایەکی تایبەتی دەردەهێنرێت. |
| زيت الطمبور | Tambor oil | ڕۆنی تامبۆر، ڕۆنێکە لە درەختی تامبۆری ناوچە گەرمەکانی ئەمریکا دەردەهێنرێت بۆ ڕەوان کردن بەکاردێت. |
| زيت الزعتر | Thymol = Thyme oil | ڕۆنی جاترە، بۆ پاکژکردنەوەو بەهێزکردن و وریاکردنەوەو باکردن بەکاردەهێنرێت. |
| زيت الزعتر البري | Savory oil | ڕۆنی جاترە کێویلە، بۆ بۆنخۆش کردن بەکاردێت. |
| زيت يولا خون | Eulachoni- oil | ڕۆنی یولاچونی، ڕۆنێکە لە جیاتی ڕۆن ماسی بەکاردێت لە ماسی (کاندل) دەردەهێنرێت. |
| زيت الخروع | Castor- oil | ڕۆنی گەرچەك، ڕۆنێکی مەیلەو زەرد و لینجە لە تۆوی گەرچەك دەست دەکەوێت بۆ مەبەستی پزیشکی و ماددەی چەور کردن و بەرهەم هێنانی دەرمانی ڕەوانی بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| زيت البتولا | Betula oil | ڕۆنی تێرو، لە داری تێرو دەردەهێنرێت لە چارەکردنی ڕۆماتیزمدا بەکاردێت. |
| زيت العظام، زيت ديبل | Bone oil | ڕۆنی ئێسك، ڕۆنێکە ئاوێتەی پێکهاتوەکانی (بیریدن)ی تێدایە لە وشکە دڵۆپاندنی ئەو ئێسقانانە دەست دەکەوێت کە چەوریان تێدایە. |
| زيت الكافور | Camphor oil | ڕۆنی کافور، لە داری کافور دەردەهێنرێت لە دروستکردنی بۆیەو سابوندا بەکاردێت. |
| زيت قشر الليمون | Oil of lemon | ڕۆنی توێکڵی لیمۆ. |
| زيت قشر البرتقال | Zest = oil of orange peel | ڕۆنی توێکڵی پرتەقاڵ. |
| زيت فول السودان | Peanut oil | ڕۆنی پاقلەی سودانی. |
| زيت القرنفل | Clove oil | ڕۆنی مێخەك، شلەیەکی زەردی بۆن خۆشە بۆ مەبەستی پزیشکی و بۆن و حەلوا بەکاردێت. |
| زيت الوقود - المازوت | Fuel oil | ڕۆنی سوتەمەنی، هەر بەرهەمێکی نەوتی سروشتی بەشێوەیەکی شل بێت و لە کورەدا بسوتێنرێت بۆ پەیداکردنی گەرمی. |
| زيت الذرة | Corn oil | ڕۆنی گەنمە شامی. |
| زيت التربنتين | Spirit of turpentine | ڕۆنی تەربەنتین، لەداری سنەوبەر دەردەهێنرێت بۆ دروستکردنی بۆیە. |
| زيت الورد - ماء الورد - عطر الورد | Rosa- Alba = oil of rose | گوڵاو، ڕۆنی گوڵەباخ. |
| عطر الديزل | Diesel oil | ڕۆنی دیزڵ، جۆرە سوتەمەنیەکە لە مەکینە قورسەکاندا بەکاردێت. |
| زيت التنظيف | Detergent oil, Flushing oil | ڕۆنی پاك کردنەوە، جۆرە گریسێکە بۆ چەورکردن و پاك کردنەوەی مەکینە، ڕۆنێکە بە پاڵەپەستۆ دەکرێت بە ئامرازەکاندا بۆ دەرکردنی خڵتەو پیسی. |
| زيت التانغ - زيت خشب الصين | Tung oil = China wood oil | ڕۆنی تانگ، ڕۆنێکی وشکە لە تۆوی درەختی تانگ دەردەهێنرێت. |
| زيت الراتنج | Rosin- oil = Rosin- grease = Rosolene | (ڕۆزولین) ڕۆنی ڕێسین ، زەمقی سنەوبەر، جەوی سنەوبەر. |
| زيت النخيل | Palm oil | ڕۆنی دارخورما. |
| زيت حب الملوك - زيت الخروع الصيني | Croton- oil | ڕۆن گەرچەکی چینی. |
| زيت بذر الكتان | Linseed oil | ڕۆنی تۆو کەتان، لە دروست کردنی بۆیەو دەرمان و پلاستیك و مشەمادا بەکاردێت. |
| زيت اللفت | Rape oil = cole oil = colza oil | ڕۆنی شێلم، ڕۆنێکە لە تۆوی شێلم دەردەهێنرێت. |
| زيت العصفر | Safflower- oil | ڕۆنی زەرتك، ڕۆنێکی وشکە تۆوی ڕوەکی زەرتك دەردەهێنرێت. |
| زيت الفلفل الحلو (الاحمر) | Oil of all spice | ڕۆنی بیبەری شیرین. |
| زيت الفلفل الاسود | Oil of black pepper | ڕۆنی بیبەری ڕەش. |
| زيت حيواني | Animal oil | ڕۆنی گیانەوەر. |
| زيت بذرة القطن | Cotton seed oil | ڕۆنی پەمودانە، ڕۆنێکی زەردی مەیلەو قاوەییە لە تۆوی لۆکە (پەمو) دەردەهێنرێت بۆ خواردن و چەور کردن بەکاردێت. |
| زيت القرفة | Cinnamon oil | ڕۆنی دارچینی، ڕۆنێکی بۆنخۆشە بۆ چارەکردنی باکردن بەکاردێت. |
| زيت الطرخون | Tarragon oil | ڕۆنی تەرخوون. |
| زيت مهدرج | Hydrogenated- oil | ڕۆنی هایدرۆجین کراو، ئەو ڕۆنی ڕوەکیە شلەبووە ناخۆشانەی کە دەکرێن بە ڕۆنی خواردەمەنی. |

| | | |
|---|---|---|
| زيت الحشيشة = زيت الافيون | Poppy oil | رۆنی تلیاك، رۆنی حەشیشە. |
| زيت الكاجبوت | Cajuput | رۆنی (کاجبۆت) رۆنێکە لە دڵۆپاندنی گەڵا تەرەکانی رووەکی میلالوکا (کەلە کۆمەڵەی مۆردە) دەستگیر دەبێت بۆ چارەکردنی باکردن بەکاردێت. |
| زيت السقي | Quenching- oil | رۆنی ئاودانەوە، رۆنێکە بۆ کرداری ساردکردنەوەی کتوپڕ بەکاردێت. |
| زيت عباد الشمس | Sun flower- oil | رۆنی گوڵە بەرۆژە، رۆنێکی زەردی کاڵی نیمچە وشکە. |
| زيت الكالبتوس | Eucalyptus- oil | رۆنــی کـالیپتۆس، رۆنێکـی بۆنخۆشـە لـە گـەڵای درەختـی کـالیپتۆس، دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی. |
| زيت ثابت | Fixed oil | رۆنی جێگیر، واتە زوو شی نابێتەوە. |
| زيت الشمر | Oil of fennel | رۆنی رازیانە. |
| زيت فول الصويا | Soya bean oil | رۆنی پاقلەی سۆیا، لە دروست کردنی رێسین و سابوندا بەکاردێت. |
| زيت عطري | Essential- oil | رۆنی عەتری، رۆنێکە لە هەندێك روەکدا هەیە لە دروسـت کردنـی بۆنـی خۆشدا بەکاردێت. |
| زيت الخردل | Mustard- oil | رۆنی خەرتەلە. |
| زيت زهر البرتقال = زيت النيرولي | Neroli oil | رۆنی پرتەقاڵ، رۆنێکی بۆنخۆشە. |
| زيتة = قرصة = خنازيرية صحراوية | Desert figwort = Desert seropularia | گیا هەنجیر، گیایەکە گوڵی– زۆر بچوك دەگرێت. |
| زيتون | Olive- tree | زەیتون، روەکێکی بـەداری هەمیشـە سـەوزە بەرەکـەی بەقـەدەر دەنکـە ترێیـەك دەبێت، سەوز و تاڵە (یەك دەنکی رەقی تێدایە) کە پێگەیی رەش هـەڵ دەگەرێت خۆش دەکرێت و دەخورێت یان دەکرێتە ترشیاتەوە یان رۆنی لێ دەردەهێنرێت. |
| زيتون بري = عتم | Wild- olive = Oleastor, Smoke bush | سونجود، سرینچك، درەختێکی دڕکاویە گوڵەکەی سپی و بچوکە بەرەکەی وردە لە بەری زەیتون دەچێت. |
| زيتــون الارض = مـــازريوم، عبال وردي جبلي | Mezereon = daphne- alpina | مازەریۆن، زەیتونی زەوی، روەکێکە لە کۆمەڵەی جاترە تاڵ و ژەهرینە. |
| زيتوني | Olivary | زەیتونی، رەنگی زەیتونی. |
| زيتوني | Olive green, Olivaceous | زەیتونی، رەنگی زەیتونی. |
| زيتونية | Olearia | زەیتونۆکە، دەوەنێکە گەڵاکەی لە گەڵای زەیتون دەچێت گوڵەکەی بۆندارو مەیلەو زەردە بۆ پەرژینی باخچە بەکاردێت. |
| زيتي | Oleous | رۆنی، چەوری، چەور. |
| زيتين | Olein = Oleine | (ئۆلیێن)، مادەیەکی چەوریە. |
| زيج -تقويم فلكي | Ephemeris | ساڵنامەی ئەستێرەوانی. |
| زير الماء، حب | Large water jar | کوپەی گەورە، کۆزەی گەورە، مەرکانە. |
| زيرقون = سليقون = سلاقون | Minium = Red lead | (منییۆم)، لید ئۆکسایدی سروشتی، رەنگەکەی سورە دەدرێت لـە ئاسـن دژی ژەنگ. |
| زيروغراف = تصوير جاف | Xerography | وێنـەگرتنی ووشـك، رێگەیەکـە بـۆ وێنـەگرتن لـە وێنـەگرتنی فۆتۆغرافـی دەچێت بەڵام پێویست بە فلمی هەستیار بۆ روناکی ناکات، بەڵکو بەتەبەقی تایبەتی کە بەکارەبا بارگە کرابێت و رەوشتی گەیاندنی رووناکی هەبێت. |
| زير النساء | Gallant = Ladies man | مێ باز. |
| زيز = زيز الحصاد | Cicada = Cicala = Harvest- fly | بەرزسیر، بەرزچیر، مێش و مەگەزێکی ناوماڵە هەندێك جار حـەڤدە سـاڵ بەشێوەی مێتولکە لە ژێر زەوی دا دەمێنێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| زيز البحر | Shrimp | ڕۆبیان. |
| زيز البحر | Mantis crab = Squilla | جۆرێکە لە قرژاڵی دەریا. |
| زيزيفورا - ريحان الحقل | Ziziphora = Fild basil | ریحانەی بێستان، ریحانەی باخ، گیایەکی کێوی پزیشکیە. |
| زيزفون - سنجد - تيليو | Lime- tree = Linden = Oleaster = Tilla = Crimean linder | سنجو، ئەحلامور، پارزی، درەختێکە گوڵەکەی سپیە بە شێوەی هێشو، بۆن خۆشە بەرەکەی وشکەو یەك تۆوی تێدایە بۆ ڕازاندنەوە، هەروەها بۆ کۆکە باشە گوڵەکەی دەکرێت بە چای بۆ ئازاری دەمارو سەر ئێشە. |
| زيزفون امريكي | Bass wood = American linden | سنجوی ئەمریکی، جۆرە درەختێکە. |
| زيط - اشراس صاجي | lavender | سرێش، جافیلوك، کێشی، گیایەکی سەلکدارە گوڵەکەی لاسکێکی درێژی هەیە کەوتۆتە ناوەڕاستەوە. |
| زيطة - ذغرة - زمداء = أم عجلان = فتاح | Wagtall | کلك هەڵسەنگێنە، باڵندەیەکی ڕەنگ بۆرە، ناوبەناو کلکی هەڵدەسێنێت. |
| زيطوط | Corn lily | سوێسنەی زوڕات، سوێسنەی گەنمەشامی، جۆرێکە لە سوێسنە گوڵەکەی بە شێوەی هێشوە، مادەیەکی لینجی لێ دەردەهێنرێت. |
| | Aberration = Deviation | نارێکی لادان، لادان لە ڕژێم یان باری تایبەتی. |
| زيغ لوني | Chromatic- aberration | لادانی ڕەنگی، بوونە پەلکە زێڕینە، ئەو پەلکە زێڕینەیەی کە لە کاتی تێپەڕبوونی تیشکی ڕوناکی سپی بە زەرەبییندا پەیدا دەبێت. |
| زيغ كروي | Spherical- aberration | لادانی خڕۆکی، لادانی خڕی. |
| زيغ ضوئي | Aberration of light = Diffraction | لادانی ڕوناکی. |
| زيغ بصري | Optical- aberration = Anaphoria | لادانی بینین. |
| زائف | Spurious = False = Forger | قەڵب، درۆزنە، فێڵ تیا کراو. |
| زيلوفون | Xylophone | (زیلۆفۆن)، دەزگای پەیژەی مۆسیقا، دەزگای پلیکانەی مۆسیقا، ئامرازێکی مۆسیقایە بریتیە لە ڕیزێك لە پارچە تەختە بە دوو چەکوشی تەختەی بچوك لێ دەدرێت. |
| زيلم، الخشب | Xylem | (زیلیم)، ئەو بەشەی کە بریتیە لە تەختە لە لەشی ڕوەکدا. |
| زيلول | Xylene = Xylol | (زایلین)، ئاوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنی پەرشەوە بوە لە پەترۆل دەچێت لە قەترانی خەڵوز دەردەهێنرێت بۆ ڕەنگ کردن بەکار دێت. |
| زيلوز = خشبوز - سكر الخشب | Xylose | (زایلۆز)، شەکری تەختە، مادەیەکی شەکرە لە دارکی گەنمە شامی دەردەهێنرێت. |
| زيموسكوب | Zymoscope | (زایمۆسکۆپ)، پێوەری ترشی ئامرازێکە بۆ پێوانی پلەی ترشان. |
| زيمومتر - مخمار | Zymometer | (زایمۆمەتر)، ئامرازێکە پلەی ترشان پیشان دەدات. |
| زيماز - زايميز | Zymase | (زایمێن)، هەوێنێکی کیمیای شەکر دەگۆڕێت بۆ ئەلکهول و گازی کاربۆن. |
| زينيا = زينية | Zinnia = Youth and old eage | (زینیا)، گوڵە پایزە، گوڵە ئەستەمبوڵی، گیایەکە گوڵی جوان هەمەڕەنگە دەگرێت. |
| زينك = خارصين | | راجع (زنك). |
| زينب = زنبل - مسك رومي | Garden- tuberose | راجع (زنبل). |
| زينابة - سمكة بيضاء | Bleak | ماسیە سپی، ماسیەکی بچوکە. |
| زينوتيم | Xenotime | (زینۆتێم)، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی کانزای یتەریۆم بە شێوەی زیخ یان بەردی زەرد یان سوور لە مەدەغشقەر و سوید و نەرویج هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| زينوبيا | Zenobia | ( زينوبيا)، دەمونێکە بۆ ڕازاندنەوە بەکاردێت . |
| زینون = زنون | Xenon | ( زینۆن) ، توخمێکی کیمیایی گازە، هاوهێزییەکەی سفرە، کەمێك لە هەوادا هەیە، یەکێکە لە گازە سستەکان ( دەگمەنەکان) ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٥٤) و کێشی ئەتۆمییەکەی (١٣١) ە، نیشانەکەی (xe) لە هەندێك گلۆپی کارەباییدا بەکاردێت. |
| زينة - زخرف | Beauty = Decoration = Oranament | ڕازاندنەوە ، دیکۆر، جوانی . |
| زينوس - قسموس | Cosmos | ( کۆزمۆس)، ڕووەکێکە گوڵی جوان دەگرێت . |
| زينوبسيلا | Xenopsylla | (زینۆپسیلا)، جۆرە کێچێکە نەخۆشی تاعوون لە مشکەوە بۆ مرۆڤ دەگوێزرێتەوە. |
| زيوليت - زيوليت | Zeolite | ( زیولایت) ، بریتییە لە ئاوێتەیەکی کیمیایی ئاڵۆز، وەکو ڕێسینی ئالوگۆڕی ئایۆنەکان کە لە سلیکەیتی ئاڵۆزی سۆدیۆم و ئەلەمنیۆم پەیدابووە، مادەیەکی زەمقیە ئەو ئایۆنی کلیسیۆم و مەگنسیۆمە هەڵدەمژێ کە دەبنە ناسازیی ئاو، واتە بۆ لابردنی ناسازی ئاو بەکاردێت ، جۆرە سروشتییەکەی بە شێوەی دەنکە ، لە دەنکی کونجی دەچێت . |
| زيوان - زؤان | Syrian = Scabion | دەغەڵ ، زیوان، گیایەکە لەناو گەنم و جۆدا دەڕوێت ، گوڵەکەی شینە، تۆوەکەی تووکی پێوەیە . |
| زيوسكوب | Zeoscope | ( زیۆسکۆپ) ، ئامرازێکە بۆ دۆزینەوەی ڕێژەی ئەلکهول لە شلکەیەکدا . |
| زي - طراز، موديل | Fashion, model | مۆدە . |
| زي - لباس | Wear = Style of dress | جلو بەرگ، پۆشاك . |
| زين | Zein | ( زیین)، پرۆتینێکە لە گەنمەشامی دەردەهێنرێت ، لە دروستکردنی پلاستیك و وەرنیش و مەرەکەبی چاپکردندا بەکاردێت . |

| | | |
|---|---|---|
| سناس، سؤاسة | Rance, Rung | تەختەی نێوانی دوودەسك . |
| سائل | Liquid, Fluid | شلە، شل، شلەمەنی . |
| سائل بوردو، محلول بوردو، مزيج بوردو | Bordeaux-mixture | شلەی بۆردۆ، تێکەڵاوی بۆردۆ، دەرمانێکە دژی نەخۆشی ڕووەك بەکاردێت لە تێکەڵاوی قسڵاو و گۆگرداتی مس ( کوپەر سولفەیت) پێك دێت . |
| سائل مائي ( في العين) | Aqueous-humor | شلاوی چاو، ئاوی چاو، شلاوە، ئاوە، ئاوی بینایی . |
| سائل زجاجي ( في العين) | Jitreous-humor | شلەی شووشەیی چاو، شلەی شووشەیی ، شووشاو. |
| سائل حاشوري | Insecticide wash | دەرمانی قەلاچۆکردنی مێش و مەگەز . |
| سائل متطاير | Volatile-Liquid | شلەی زوو بە هەڵم بوو، شلەی سووك، شلەی پەرشەوەبوو . |
| سائل قطبي | | شلەی جەمسەریی، شلەی پۆڵی . |
| سائل مخاطي | Mucusfluid | شلەی لینج . |
| سائل منوي | Seminal-fluid, Spermatic fluid | ئاوی پیاو، تۆم ، تۆماو، شاوەت، پامیزە، شلەیەکی لینجە سپێرمەکان و دەردراوی پرۆستاتە و لووی کۆپەری تیدایە . |
| سائل عنكبوتي | Archnoid-fluid | شلەی جاڵجالۆکەیی، شلەیەکە لەناو پەردەکانی دەوری مێشکدا هەیە . |
| سائل حراري | Dow therm | شلەی گەرمی، ئەو شلەیەی کە ناوەندێکی باشە بۆ گواستنەوەی گەرمی |
| سائل الاستسقاء | Ascitic-fluid | ئاوی ئاوبەنگ، شلەی ئاوبەنگ |
| سائل زلالي مفصلي، سائل مزلق | Synovial-cystal | شلەی پرۆتینی جومگە، ئەو شلە پرۆتینی‌یە لینجەیە کە لە جومگەی ئەژنۆدا هەیە . |
| سائل بلوري | Liquid-crystal, Crystal-liquid | شلەی بلووری، مادەیەکی ئەندامی‌یە بریتی‌یە لە دۆخێکی تری مادە، دەکەوێتە نێوانی دۆخی ڕەق و دۆخی شلەوە، مادەیەکی لینجی ولۆڵەیی‌یە، لەمەدا لەشلە دەچێتو لەپەرتکردنەوەی ڕووناکیدا لە بلوور دەچێت باشترین نموونەش بۆ ئەم جۆرە مادەیە ئەستەری کۆلیسترۆڵە . |
| سائل الدم | Blood plasma | شلەی خوێن ، زەرداوی خوێن، زینچکاو. |
| سائل مخي شوكي | Cerebrospinal | شلەی مێشکی مەغزیی. |
| سائل هاضم | Digestiv-fluid | شلەی هەرسکەر . |
| سائل التية، لمف داخلي، سائل الاهتزاز | Scarapss-liquor, Endolymph , Aqua labyrinthe | لیمفی ناوەوە، ئاوەلەرزە، شلەیەکە لەناو ئێسکی ئاوەوی گوێچکەدا هەیە . |
| سائد | Prevalent, Ascendant | زاڵ، باو، سەرکەوتوو. |
| سائد ، متفوق | Dominant | زاڵ. |
| سائب | Floating, Abandoned | بەرەڵا. |
| سائر | Going, Walking | ئەوەی دەڕوات . |
| سائر اثناء النوم | Somnam-bulist, Night-walker | ئەوەی بەدەم خەوەوە دەڕوات . |
| سائمة | Lirestock | ئاژەڵێك کە لە دەشت بژی ، ئاژەڵ، پەڕەوڵ، پەلەوەر. |
| سائح | Tourist | جیهان گەڕ، گەشتکەر، گەشتیار . |
| سائق | Driver | ئاژوەر، لێخوڕ، شوفێر، ڕاننده. |
| سائط | Flagellant | قامچی وەشێن ، جەلاد. |
| سائس، سائس الخيل | Groom, Stableman | سەیز، سایس، مەیتەر، مەیتەروان، کەسێکە بۆ خزمەتی ئەسپ وچارەوێ ڕاگیرابێ. |

| | | |
|---|---|---|
| سام، سامة، ملل | Weariness, Boredom, Taedium | بێتاقەتی، بێزاری، وەڕسی. |
| سابین ، ابهل، شابین | Sabina | هەڤریسکۆکە، جۆرێکە لە درەختی هەڤریسك ( عەرعەر) ، قەدەکەی بچووکە ٣-٤ مەتر بەرز دەبێتەوە ، گەڵاکەی دڕکاوییە و بەرەکەی ڕۆنی سابینی لێدەردەهێنرێت بۆ سارێژکردنی برین . |
| سابین | Sabina | ( سابینا ) ، یەکەی هەڵمژینی دەنگ. |
| سابر | Probe | پشکنەر ، ئامرازی پشکنین . |
| سابر فضائي | Spaceprobe | پشکنەری بۆشایی، گالیسکەیەکە بۆ پشکنینی بۆشایی نێوانی ئەستێرەکان بەکاردێت. |
| سابع | Seventh | حەوتەم، حەفتەم. |
| سابق | Former, Precedent, Previous | پێشوو، ڕابردوو. |
| سابندیات ، صابونیات | Sabindaceae | ( سابینداسیا)، کۆمەڵێکە لە ڕووەك بە شێوەی دار و دەوەن . |
| سابلین | Zibeline | (زیبیلین)، قوماشێکی خوری نەرم و لوسە. |
| ساباط | Arcade, Archway | سابات، کەپر. |
| ساباط | Sabat | چوخم، تاقێك قاتی سەرەوەی دووماڵ بگەیەنێت بە یەکتری و ژێرەکەی ڕێگە بێت. |
| سابوت، شبوط | Carp | سوورە ماسی، جۆرە ماسییەکە. |
| سابوديلا | Sapodilla, Naseberry | (ساپۆدیلا)، درەختێکی بەرزی هەمیشە سەوزە، زەمقێك لە توێکڵەکەی دەر دەهێنرێت پێی دەگوترێ (چیکل) وەکوو بنێشت دەجوورێت. |
| سابال نخيلي | Sabalpalm | دارخورمای سابال، جۆرە درەختێکە لە دارخورما دەچێت. |
| سابوناريا، صابوناريا، عرق الحلاوة | Saponaria, Soapwort | (ساپۆناریا)، جۆرە ڕووەکێکە مادەی ساپۆنینی لێ دەردەهێنرێت. |
| سابح | Pelagic, Swimmer | مەلەوان. |
| سابحة، طائرة شراعية | Glider | فڕۆکەی چارۆکەدار. |
| سابريميا، تعفن الدم | Sapremia | (ساپریمیا)، تایەکە لە ئەنجامی چوونی مادەی بۆگەن بۆ ناو خوێن پەیدا دەبێت. |
| ساتان، أطلس | Satin | (ساتان)، قوماشێکی ئاوریشمیی سافە. |
| ساتينية، ستينية | Sateen, Satinet | (ساتان)، قوماشێکە لە لۆکە دروست کراوە. |
| ساج، دلب هندي | East Indian tree, Teak tree | ساج، درەختێکی ناوچە گەرمەکانە، تەختەکەی ڕەشە و زۆر جوان و نایابە، گوڵەکەی سپی و بۆن خۆشە، بەرەکەی خڕە و دەخورێت. |
| ساجو، سبوس | Sajou | (ساجۆ)، جۆرە مەیموونێکە. |
| ساجوم | Wetting | ئەو شلە لینجیە کە دەکرێتە دەرمانەوە. |
| ساجور | Neck lace of dogs | سەمەندۆك، ئەڵقەیەکی تەختەیە دەکرێتە ملی سەگەوە. |
| ساجيات، رعي الحمام | Verbena | مینا، گیایە کە گوڵی جوان دەگرێت بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| ساجيتا، سهم | Sagitta | تیر. |
| ساجيتا، سهم | Sagitta | تیرەکرم، جۆرە کرمێکی دەریایی تەنکە، لە ئاوی دەریادا دەژی، شێوەکەی لە تیر دەچێت بە ئۆرەی یەك لە دوای یەك دەر دەپەڕێت. |
| ساجينة | Pearl wort | ڕووەکی مرواری، گیایەکە لە کۆمەڵەی مێخەك. |
| ساحة | Yard | گۆڕەپان، مەیدان، حەوشە. |

| | | |
|---|---|---|
| ساحب | Drawer | راكێشەر. |
| ساحبة، جرارة | Tractor | (تراكتۆر)، مەكینەی ڕاكێشان. |
| ساحل | Shore, Coast | كەنار، قەراغ، پەڕ، ڕۆخ، بەراف. |
| ساحل البحر | Sea-shore, Sea-coast | دەریابار، دەریا پەڕ، كەناری دەریا. |
| ساحلي | Littoral | قەراغ دەریایی، كەناری دەریایی. |
| ساحر | Charmer, Sorcerer | جادووگەر، نێرەنگ ساز، جازوگر. |
| ساحر، فاتن | Ravishing | دڵڕفێن، دڵفڕێن. |
| ساحق | Crusher | وردكەر، تێك شكێنەر. |
| ساخن، حار | Warm, hot | گەرم. |
| ساخنة، سخانة | Geyser | (گیزەر)، گەرمكەر، دەزگای ئاو گەرم كردن. |
| ساد، سناد، تابير | Tapir | تاپیر، گیاندارێكی كێویی بەڵەكی لمۆز درێژە لە بەراز دەچێت. |
| ساد | Occludent, Occlusor, Occlusive | داخەر. |
| ساد، سَدّ، اظلام العدسة | Cataract | (كاتاراكت)، ئاوی سپی، تەمی زەرەبینی چاو، ئاوی مرواری. |
| سادة (لون) | Unicolour | ڕەنگی سادە. |
| سادة، بسيط | Simple, Plain | ساكار. |
| سادج، قرفة ملابار | Malabar-cinnamon | دارچینیی، مالابار، درەختێكە ڕۆن و بۆنی نایابی لێ دەر دەهێنرێت. |
| سادس | Sixth | شەشەم، شەشەمین. |
| سادس فلوريد البلاتين | Platinum hexa floride | شەشەم فلۆریدی پلاتین، مادەیەكی كیمیاییە. |
| سادس المثيلين، ثنائي الأمين | Hexa methylene diamine | شەشەم مەثیلین، دووەم ئەمین، ئاوێتەیەكی كیمیاییە بە شێوەی توێژاڵی بێڕەنگە، لە دروستكردنی پولیمەرەكانی وەكوو نایلۆندا بەكاردێت. |
| سادس عشر | Sixteenth | شانزەهەم، شانزەمین. |
| سادي | Sadist | (سادی)، ئەو كەسەی كە ئارەزووی ئازاردانی ڕەگەزیی مێیەكەی دەكات لە كاتی جووت گرتندا. |
| سادية | Sadism | (سادیزم)، سادێتی، نەخۆشییەكی دەروونییە. نەخۆشەكە حەز بەوە دەكات ئازاری هاوسەرەكەی خۆی بدات، لە كاتی جووت گرتندا، یان لە كاتی پەڕیندا. جۆرە هەوەسێكە لە كاتی پەڕیندا وا لەو كەسە دەكات كە حەز بە ئازاردانی هاوسەرەكەی دەكات، وەك لێدان و گازگرتن. |
| ساذج (للانسان) | Simple-hearted, Sawny, Silly | ساویلكە، بوودەڵە، دڵساف. |
| ساذج | Simple | سادە، ساكار. |
| ساذج هندي، ملستومة | Gooseberry, Indian Spikenard, Malabathrum | كشمیشی هیندی، دەوەنێكە بەرەكەی بۆن و تامی خۆشە، ناوكەكەی شیرینە. |
| ساركوكول، عنزروت | Sarcocol | (ساركۆكۆل)، كەتیرە. |
| سارية، صارية السفينة | Mast, Spar | تێلا، كۆڵەكەی كەشتی، هوستون، دگلی كەشتی، تەیاخ. |
| سارية | Mast, Malus | تێلا، كۆمەڵە ئەستێرەیەكە. |
| سارتوريت | Sartorite | (سارتۆریت)، یەكێكە لە كەرەسە خاوەكانی كانزای (میتاڵی) ئالیوم، قورقوشم و زەرنیق وكۆگردی تیادایە كریستاڵەكەی بە ڕەنگی خۆڵەمێشی مەیلەو ڕەشە. |

| | | |
|---|---|---|
| ساردين، سردين | Sardine | (ساردين)، جۆرە ماسی‌یەکی بچووکە، دەکرێتە قوتووەوە. |
| ساراسين | Sarracenia | (ساراسینیا)، رووەکێکی پزیشکیی مێروو خۆرە، گەڵاکەی لە زووڕنا دەچێت. |
| سارح الفكر | Absent-minded | خەیاڵ ڕۆیشتوو، هۆش بە خۆ نەبوو. |
| سار، معدٍ | Contagious, Infectious | درم، پەتا. |
| ساس | Sass wood | داری (ساس)، درەختێکە توێکڵەکەی ژەهرە. |
| ساس، صاص، صلصة | Sauce | (ساس)، (سۆس)، سرکەیەکە بەهاراتی تێدەکرێت بۆ زەڵاتە. |
| ساسفراس | Sassafras | (ساسافراس)، درەختێکە توێکڵەکەی بۆ بۆنخۆشی بەکاردێت. |
| ساسالي، شرعوب مخزني | Small hort-wort | (ساسالی)، رازیانە کێویلە، گیایەکی کێویی پزیشکی‌یە، گوڵەکەی سپی‌یە لە شێوەی چەتردایە. |
| ساسم، ابنوس | Ebony | ئەبەنۆس، درەختێکی گەورەیە تەختەکەی بۆن خۆشە و بەنرخە و بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| ساسوليت | Sassolite | (ساسولیت)، ترشی بۆریك، بۆریك ئەسید. |
| ساسب، سيسم، سيسب، شيشام، ساسم اصفر، سيسو، دلبرجية سيسو | Sisso tree, Shisham, Black , Wood, Dalbergia sissoo | (شیشام)، (سیسۆ)، (سیسەم)، درەختێکی گەورەی ناوچە گەرمەکانە لە هیندستان دەڕوێ، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی سپی‌یە، رۆنێکی تایبەتی لێ دەردەهێنرێت و تەختەکەی قاوەیی‌یە و نایابە. سیسەمی نووستن و کەلوپەلی ناوماڵ و تیروکەوانی لێ دروست دەکرێت. |
| ساسوريت | Saussurite | (ساسوریت)، بەردێکی نیمچە بەنرخە. |
| ساطور، سكين كبير | Cleaver , Chopper | قەسەتۆرە، کێرد، قیمەکێش، جەخار، سیکارد، گەزلك، چەقۆی گەورە. |
| ساطع شديد الضوء | Radiant, Glary | رووناکبەخش، بلێسەدار، پرشنگدار. |
| ساعة | Hour | سات، یەکەیەکی کاتە، شەست خولەکە. |
| ساعة | Clock, horologe | کاتژمێر، ئامرازی کات ژماردن. |
| ساعة | Horologium | سات، کاتژمێر، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشووری‌یە. |
| ساعة حائط، ساعة جدارية | Clock | کاتژمێری دیواری، سەعاتی دیوار، سەعاتی چاڵمە. |
| ساعة تنبية، ساعة منبهه، ساعة ذات جرس | Alarm clock | کاتژمێری وریاکەرەوە، کاتژمێری زیل، کاتژمێری زەنگ. |
| ساعة تدوير، ساق التدوير | Clock drive | کاتژمێری خولاندنەوە، دەسکی خولاندنەوە، دەزگایەکە بەردەوام تەلیسکۆپ بەرەو ئاسمان دەخولێنێتەوە، هەر (٢٤) سەعات جارێك خولێکی پێ دەدات. |
| ساعة توقيت، ساعة سباق | Stop clock, Stop watch | کاتژمێری پێشبڕکێ، جۆرێکە لە کاتژمێر، دەتوانرێت میلەکەی بخرێتە ئیش یا بوەستێنرێت، بۆ پێشبڕکێ بەکاردێت. |
| ساعة الجوامع | | کاتژمێری منارەی مزگەوت، کاتژمێرێکی گەورەیە. |
| ساعة رملية | Hour glass, Sand glass | کاتژمێری لمی، سەعاتی لمی. |
| ساعة يدوية | Wrist watch | کاتژمێری دەست. |
| ساعة جيب | Watch | کاتژمێری گیرفان. |
| ساعة منضدية | Table clock | کاتژمێری سەرمێز. |
| ساعة كهربائية | Electric clock | کاتژمێری کارەبا، جۆرێکە لە کاتژمێر بە کارەبا ئیش دەکات. |
| ساعة مدورية | Stem wider | کاتژمێرێك کە بە میقات (قورمیش) ئیش بکات. |

| | | |
|---|---|---|
| ساعة ذرية | Atomic clock | کاتژمێری ئەتۆمی، سەعاتێکە کاری توخمە سروشتی‌یە تیشکدەرەکانی وەك بورانیۆم دەردەخات لە مەیانی چۆنێتی پەیدابوونی توێکڵی زەویدا. |
| ساعة فلكية | Astronomical clock | کاتژمێری ئەستێرەوانی، سەعاتی ئەستێرەوانی. |
| ساعة مائية | Clepsydra, Water clock | کاتژمێری ئاوی ، سەعاتی ئاوی ، ئامرازێکە بۆ پێوانی کات بە دلۆپاندنی ئاو. |
| ساعة شمسية ، مزولة | Sundial | کاتژمێری خۆریی. |
| ساعة نجمية | Sideral hour | کاتژمێری ئەستێرەی، ١/٢٤ ی ڕۆژی ئەستێرەیی. |
| ساعاتي، صانع الساعات | Watch maker, Horologer, Horologist | کاتژمێرساز، سەعاتچی . |
| ساعي | Messenger | نامەبەر. |
| ساعي البريد | Postman | پۆستەچی . |
| ساعد | Forearm | باسك، قۆڵ. |
| ساعور الكحول، مصباح كحولي | Spirit-lamp | چرای ئەلکحولی ، قوتیلەی ئەلکهولی، بۆ شتومەك گەرم کردن لە تاقیگەدا بەکاردێت . |
| ساغو، ساجو، دقيق النخيل | Sago | ( ساگۆ)، نیشاستەیەکە لە درەختی دارخورمای ساگۆ دەردەهێنرێت . |
| ساغوتية، نخل النشا | Sago palm | دارخورمای ساگۆ، جۆرە درەختێکە لە دارخورما دەچێت ، کرۆکی قەدەکەی بریتی‌یە لە نیشاستە پی‌ی دەگوترێت ( ساگۆ) . |
| سافرول، زعفرول | Safrole | ( سافرۆل) ، شلەیەکە لە ڕووەکی زەعفەران دەگیرێت ، لە دروست کردنی عەتردا بەکاردێت ، هەروەها دەرمانی سەرئێشە و ڕۆماتیزمی لێ دروست دەکرێت. |
| ساف، سعاف | Agnail, Hang nail | قلێشی پێستی نینۆك، زیادە گۆشتی دەوری نینۆك. |
| سافرة | Redd grass | گیاقامیش ، ڕووەکێکە قەدی ژێرزەوی هەیە، گوڵەکەی خڕە . |
| سافة | Layer | چین . |
| سافانا، سفناء | Savanna, Savannah | ( ساڤانا)، دەشتێکی بێ‌درەخت کە گیای درێژی تیاد بێت . |
| سافرانين | Safranin | ( سافرانین)، ڕەنگێکی ئەندامی سوورە، هەروەها ژەهرە بۆ ڕەنگ کردنی خوری و ئاوریشم و لۆکە بەکاردێت . |
| سافوا، كرنب السافوا | Savoycabbage | کەلەرمی ساڤۆری، جۆرێکە لە کەرلەرم . |
| ساق ( للانسان) | Leg, Scapus, Shank | لاق، لنگ، قاچ، قول. |
| ساق النبات ، جذع النبات | Stem, Trunk, Stock | قەد، قەف. |
| ساق منتصبة | | قەدی قنج، قەدی قیت. |
| ساق الورقة | Stalk | لاسکی گەڵا. |
| ساق مائية | Hydrocaulus | قەدی ئاویی، قەدێکی ڕووەکی‌ی کەلە ئاودا بێت. |
| ساق ارضية | Underground-stem | قەدی ژێر زەوی . |
| ساق الحصان، وظيف | Shank | لاقی وولاخ . |
| ساق ملتفة، عطفة | Twinging plant | قەدی خۆپێچ، قەدێك کە خۆی بئاڵێنێت لە شتی ترەوە . |
| ساق عشبية | Herbaceous-stem | قەدی گیایی. |
| ساق زاحفة | Prostrate-stem | قەدی خشۆك . |
| ساق خشبية | Woody-stem | قەدی دارین ، قەدی تەختەیی. |
| ساق عسقولية ، ساق درنية | Tuberous-stem | قەدی سەلکی، وەکو سەلکی پەتاتە. |

| | | |
|---|---|---|
| ساق متسلقة | Climbing- stem | قەدی خۆهەڵواس، قەدی هەڵگەڕاو. |
| ساق الحمام، كالومبا | Calumba, Colubine | لاقەکۆتر، ڕووەکێکە گوڵی هەمەڕەنگ دەگرێت ، تویژاڵی وشککراوەی ڕەگەکەی دەرمانی لێدەردەهێنرێت بۆ پشێوی هەرس . |
| ساق الريشة | Rhachis | قەڵەمی پەڕ، بەشی سەرەوەی پەڕی باڵندە . |
| ساق الورقية | Phylloclades | قەدی گەڵایی، وەکو لە ڕووەکی هەنجیری دڕکاوییدا. |
| ساق جنينية | Plumule | قەدی کۆرپەلەیی. |
| ساق شوكية | Spiny stem | قەدی دڕکاوی . |
| ساق ريزومية | Rhyizome | ( رایزۆم)، جۆرێکە لە قەدی ژێر زەوی، |
| ساق العين | Eye-penduncle, Ophthalmite | لاسکی چاو، لاقیچاو، وەکو لە گیاندارە توێکڵدارەکاندا هەیە . |
| ساق بصرية | Optic stalk | لاسکی بینایی، قەدی بینایی. |
| ساق، قصبة الرجل، عضم الساق | Shank, tibia | لاق، قامیشەی لاق . |
| ساق المخ | Crura-cerebri | قەدی مێشك، لاسکی مەژی، لاسکی مێشك. |
| ساق مجوفة | Hollow stem | قاڵور، قەدێکی ناوبۆش. |
| ساق المخيخ | Crura-cerebelli | قەدی مێشکۆڵە، لاسکی مێشکۆڵە . |
| ساق سوداء، جمرة عرضية | Black leg, Symptomatic-anthrax | لاڕەشە، نەخۆشی‌یەکی میکرۆبی درمە تووشی مانگا دەبێت . |
| ساق العظم ،اسطوانة العظم | Diaphysis | لوولەی ئێسك، قەدی ئێسك . |
| ساق التدوير | Clock drive | بڕوانە ( ساعه التدوير) . |
| ساق الزهرة | Peduncle | لاسکی گوڵ . |
| ساق المثلث | Side, Leg | لا، لای سێگۆشە . |
| ساقي الشراب | Butler, Cup-bearer | مەیگێڕ، ئەو کەسەی شەراب دەگێڕێ . |
| ساقي، ساكب الماء | The water bearer, Aquaris | ئاودێر کۆمەلە ئەستێرەیەکە. |
| ساقي الارض | Irrigater | ئاودێر،ئەوکەسەی زەوی ئاودەدات . |
| ساقية ، خادمة الحانة | Barmaid | ئەو کچەی کە لە مەیخانەدا خزمەت دەکات . |
| ساقية، نهر صغيرة | Streamlet | جۆگە، جۆبار، جۆگەڵە، جۆ. |
| ساقية، ناعورة | Water-wheel, Noria, Chin pump | جەنجەڕی ئاو، چەرخی ئاو . |
| ساقط، سافل | Degraded | مرۆڤی سووك، بێئابروو، مرۆڤێکی کەوتوو، بەدڕەوشت. |
| ساكت | Silent, Dormant | بێدەنگ، کپ، کر، کش، لەسەرخۆ، هێمن . |
| ساكن الاكواخ | Shantyman | دانیشتووی زنج و قوخته، زنج نشین . |
| ساكن الغابات | Nemophilous | جەنگەڵ نشین، دارستان نشین. |
| ساكن | Stator, Static | وەستاو، نەجووڵ، جێگیر . |
| ساكن | Mute, Static, Motionless, Still, Quiet, Stationary | نیشتەجێ، هێمن، بێدەنگ، وەستاو. |
| ساكسوفون، سكسية | Saxophone | ( ساکسۆفۆن)، ئامرازێکی مۆسیقایە . |

| | | |
|---|---|---|
| ساكن المستنقعات ، طيطوي المروج | Marsh-sand piper | چۆلەکەی زەلکاو، باڵندەیەکی بچووکە. |
| ساكولينا | Sacculina | ( ساكۆلینا)، گیاندارێکی توێکڵداره لەسەر لەشی قرژاڵ دەژی. |
| ساكن الدم | Sanguicolous | خوێن نشین، وەکو ئەو گیانەوەرە مشەخۆرانەی لە خوێندا دەژین . |
| ساكورليت | Sakurlite | ( ساكورلێت)، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی کانزای ئیندیۆم، مس و تۆتیا و گۆگردی تێدایە تازە لە یابان دۆزراوەتەوە . |
| ساكي، ساقي، ساكس | Sakis | ( ساكی )، جۆرە مەیمونێکە ریش و کلکی تیسکنە . |
| ساكي | Sake, Saki | ( ساكی)، مەیەکی یابانییە، لە برنج دروست دەکرێت . |
| سالب | Negative | سارد، ( نێگەتیڤ) (−) ، کاتۆد. |
| سالبية | Negativity | ( نێگەتیڤی) ، سالیبی، سالبیەت. |
| سالبية كهربائية | Electro-negativity | نەگەتیڤی کارەبایی، سالبێتی کارەبایی. |
| سالخ | Black snake | ڕەشمار . |
| سالم | Safe | سەلامەت، ساغ . |
| سالمون، سلمون، سمك سليمان | Salmon | ( سالمۆن)، ماسییە سلێمانکە، جۆرە ماسییەکە . |
| سالف العروس، قطيفة ، عمار | Cockscomb, Amaranth | گوڵەقەیفە، بادرۆ، ئاتەشی، شەست پەڕ، جۆرە گیایەکە لق و گەڵا و گوڵەکانی ئەرخەوانین. |
| سالف، متقدم | Prior, Preceding | پێشینی، پێشینیان ، پێشوو، دێرین . |
| سالمونيلا، سلمونية | Salmonella | ( سالمۆنیلا) ، جۆرە میکرۆبێکە . |
| سالفيا، مريمية، قويسة، قصعين | Sage, Salvia | ( سالڤیا)، جۆرە ڕووەکێکە هەندێکی دەشتەکییە دەرمانی بەهێزکردن و وورياکردنەوە لە گەڵاکانی دەردەهێنرێت . |
| سالفيا عطرية | Sweet-salvia, Aromatic-Salvia | سالڤیای عەتری، گیایەکی تەمەن درێژی هەمیشە سەوزی بۆن خۆشە، گەڵاکانی تووکن و مەیلەو سپین، گوڵەکەشی شینی مەیلەو ئەرخەوانییە، گەڵاکەی وشك دەکرێت و دەکرێتە ناو پەنیر و شۆربا و گۆشتەوە، ئاوەکەی دەگیرێ بۆ کرم فرێدان و ئارەق کردنەوە و بەهێزکردنی گەدە و پاککردنەوەی ناو دەم باشە. |
| سالفرسان، سلفرسان | Salvarsan | ( سالڤرسان)، دەرمانێکە زەرنیقی تیادایە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی فەرەنگی. |
| سالول | Salol | (سالۆل)، جۆرە دەرمانێکە بریتییە لە سالیسیلاتی فەنیل بۆ پاكژکردنردنەوە بەکاردێت . |
| ساليسين | Salicin | ( سالیسین)، ئاوێتەیەکی کریستاڵی سپی تاڵە لە توێکڵی داری بی دا هەیە ، دەرمانی لێدروست دەکرێت بۆ هێنانە خوارەوەی تا. |
| ساليتوم، بقدنوس جبلي | Milk parsley | مەعدەنووسی شاخی، گیایەکی کێویلەی پزیشکییە . |
| ساليسلات | Salicy late | ( سالیسیلات)، خوێی ترشی سالیسیلیك. |
| ساليقارية | Purple looseestrite | گیایەکە گوڵی ئەرخەوانی دەگرێت . |
| سالسولا، سُلج، نبات القلي | Salsola | ( سالسولا)، ڕووەکی قڵیە، مادەی کاربۆناتی سۆدیۆمی لێ دەردەهێنرێت بۆ دروست کردنی سابون. |
| سام | Toxic, Toxicant | ژەهراوی، ژەهرین. |
| سأمان، سامان | Sagittaria | جۆرە قامیشێکە حەسیری لێدروست دەکرێت . |
| سأمة الحياة | Wearness of life | وەڕس بوون لە ژیان، بۆغزاندنی ژیان، بێتاقەت بوون لە ژیان. |

| | | |
|---|---|---|
| سام ابرص، صداد، وزغة، ثعبة ، ابو بريص | Gecko | شەوگەرد، سەرمازەڵ، سووسەمار، دیلەمار، پیس پیسۆك، جۆرێكە لە مارمێلكە . |
| سامة | Seam | چینێكی تەنك لە كانزا. |
| سام، خيزران | Bamboo | درەختی حەیزەران، تەركەن، دارسیواك. |
| سامبوكس، سمبوقة، شجرة البلسان | Sambucus | داری بەیلەسان، دەرمانی ورپاكردنەوە و ئارەق كردنەوە لە گەڵاكەی دەردەهێنرێت . |
| سامسين | Samisen | ( سامیسین)، ئامرازێكی مۆسیقای یابانییە . |
| ساميت | Samite | ( سامیت)، قوماشێكی ئاوریشمییە دەزووی زێر و زیوی لەگەڵدایە. |
| سامور | Rough-diamond | ئەڵماس، ئەڵماسی سروشتی . |
| سامط، مزيل الشعر | Depilatory | داڕووی گەرماو، دەرمانی حەمام . |
| سامك، طُول | Stilt | پێدرێژە، جۆرێكە لە مراویی، ماسی دەخوات . |
| سامبر، صمبر | Sambar, Sambur | سامبەر، جۆرێكی گەورەیە لە فیلەگێژە . |
| سامبا | Samba | ( سامبا)، جۆرە سەمایەكی بەرازیلییە لە بنەڕەتدا ئەفریقاییە . |
| ساماريوم، سمريوم | Samarium | ( ساماریوم)، توخمێكی كانزاییە، هاوهێزەكەی (٣) و ژمارەی ئەتۆمییەكەی (٦٢) و كێشی ئەتۆمییەكەی (١٥٠) و نیشانەكەی ( Sm) ە. |
| سانيدين | Sanidine | ( سانیدین)، جۆرێكە لە بەردی فیلدسپار بریتییە لە سلیكاتی ئەلەمنیۆم و پۆتاسیۆم، ڕوون و بێڕەنگە یان خۆڵەمێشییە. |
| سانية، ناعورة | Noria, Water wheel | ئاوهەڵگۆز، دەزگایەكە بۆ بەرزكردنەوەی ئاو بە وڵاخ یان ئامرازی جوڵێنەر نیش دەكات . |
| سانتين | | خەیاتە، سانتین، سامتین، دەزوویەكە بۆ چنین بەكاردێت . |
| سانتونيكا، ارتميزيا | Levant worm seed, Santonica | بۆن خۆشكە، وەخشیرك، كرمكوژ، جۆرە ڕووەكێكە . |
| سانتونين، درفنين | Santonin, Santominum | ( سانتۆنین)، دەرمانێكە ژەهرە بۆ كوشتنی كرمی دەزوولەیی لە لەشی وڵاخ و ئاژەڵدا بەكاردێت ، لە ڕووەكی ( سانتونیكا) واتە ئەرتیمزیا دەردەهێنرێت . |
| ساند، مسند | Support, prop | پشتۆك، پشتیوان. |
| ساندرس، صندل احمر | Fiddle wood, Saunders | سەنەلی سوور، دەوەنێكە تەختەكەی بە نرخە . |
| سانوج، حبة سوداء | Black cumen | ڕەشكە، سیاوڵە، گیایەكە دەنكێكی بۆن خۆشی هەیە دەكرێتە نانەوە. |
| سانردول | Sandrol | ( ساندرۆل)، مادەیەكە بۆ پاككردنەوە بەكاردێت . |
| ساهر، ذيل الكلب | Dogs tail | كلكە سەگ، گیایەكی كێوییە لە كۆمەڵەی گەنم ، بۆ لەوەڕ باشە. |
| ساهج | Strong wind | بایەكی بەتین. |
| ساهج، كاشط | Abrasive | مادەی كرێنەر. |
| ساهور، هالة | Halo | خەرمانە، وەكو خەرمانەی مانگ یان خۆر . |
| ساهور، ساروس | Saros | (ساڕۆس)، خولی ڕۆژگیران و مانگگیران كە هەر (١٨) ساڵ و (١٠) ڕۆژ جارێك دووبارە دەبێتەوە . |
| ساهكة | High winds | بای بەهێز، جۆرە بایەكە كە خێراییەكەی (١٨) مەترە لە چركەیەكدا . |
| ساوري، صوري | Saury | ( ساوری)، ماسییەكی لموز درێژە. |

| | | |
|---|---|---|
| سايلة | White-face, Head-bloze | مارز، پەڵەی سپی بە ناوچەوانی وولاّخ یان ئاژەڵەوە . |
| سايكون | Sycon | جۆرێکە لە ئیسفەنج . |
| سايف، سائف، متاكل | Corrosive | سواو، داخوراو. |
| سايتوبلازم | Cytoplasm | ( سایتۆپلازم)، پرۆتۆپلازمی ناو خانەی زیندەوەر، ( جگە لە ناوك)، بەشی ناوەوەی خانە . |
| سايكلوب | Cyclops | ( سایکلۆپ)، گیاندارێکی توێکڵدارە تەنها چاوێکی خڕ وا بە سەریەوە. |
| سايلو، هُري | Silo, Bin granary | ( سایلۆ)،عەمار، کەندو، عەماری گەنم و ئالیك. |
| سايكلومتر | Cyclometer | ( سایکلۆمەتر)، ئامرازێکە بۆ تۆمارکردنی ژمارەی خولانەوەی ڕەوڕەوە. |
| سايكلوترون | Cyclotron | ( سـایکلۆترۆن)، مەکینەیـەکی زۆر بـەهێزە پارچـە ناوکی‌یـە کارەبایەکان بە شێوەیەکی پێچاوپێچ دەسوڕێنێتەوە و خێرای‌یەکی زۆریـان پێ‌پـەیدا دەکـات و دەیـان کـات بـە گوللەیـەکی ئـەتۆمی (هاوێژراوی ئەتۆمی)بۆ ئەوەی بگیرێتە ناوکی ئەتۆمەکانی کانزاکانی تر بۆ تەقاندنیان. |
| سايديريت | Siderite | (سایدیریت)، کەرەسەیەکی خاوی ئاسـنە بریتی‌یـە لـە کاربۆنـاتی ئاسـن، ڕەنگەکەی خۆڵەمێشی یان زەردی مەیلەو قاوەی‌یە . |
| سايكلوترون، متواقت، سينكرۆسايكلوترون | Synchro-cyclotron | ( سینکرۆسایکلۆترۆن)، جۆرێکـە لـە سـایکلۆترۆن، خـێرایی تەنۆکـەکان دەگەیەنێتە نزیکەی خێرایی ڕووناکی . |
| سايكاس، سيكاد، نخل الساغو | Sago palm, Cycas, Cycad | ( سایکاس) ( سایکاد): دەوەنێکی جوانە بە گەلاّ لە دارخورما دەچێت لە پێکهاتندا، لە ئینجانەدا لە سنەوبەر دەچێت ، هەمیشە سەوزە، گەلاّکەی لە پـەڕ دەچێـت، لـە ئینجانـەدا بـۆ جوانـی دەڕۆێنرێت، نیشاستەیەك لـە قەدەکەی دەردەهێنرێت پێ‌ی دەگوترێت (ساگۆ). |
| ساسكلامين، سكعين | Cyclamen | (سایکلامین)، مادەیەکی ئەلکالی ژەهرە. |
| سب، شاش | Bandage, Cheese-cloth | شاش بۆ پێچانەوەی برین . |
| سباء، سبيئة | Wine | شەراب، مەی. |
| سبارينا، حشيشة المحمودة | Sarsa, Sarsaparilla | ( سارسا)، گیا مەحموو، گیایەکە دەرمان لە ڕەگەکەی دەردەهێنرێت. |
| سبات | Dormancy | سڕبوون، مت بوون، کەرخین، تەمش. |
| سبات الارض، استراحة الارض | Fallow-break | بەجێهێشتنی زەوی بۆ ماوەی ساڵێك یان زیاتر بەبێ ئەوەی کشتوکاڵی تیادا بکرێ پێ‌ی دەگوترێت ( بەیار) . |
| سبات، غيبوبة | Coma, Lethargy | نووسن، مت بوون، سستی، سڕبوون، سڕیی، متی. |
| سباتي | Carotid, Carotic | پەیوەندی بە خوێنبەری ( کارۆتید) وە هەیە. |
| سبادلة، خربق | Sabadilla, Cebadilla | ( سبادیلا)، خەربەنگ، جۆرە ڕووەکێکە گەڵاکەی درێژە دەنکەکەی تاڵ و ژەهرە. |
| سباح | Swimmer | مەلەوان، ئاوباز، کەسێك کە لە ئاوی زۆردا نەخنکێ . |
| سباحات، كفيات القدم | Palmeipeds, Natatores | کۆمەڵە باڵندەیەکە پەنجەکانیان پێکەوە نووساون، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە بۆ مەلەکردن یاریدەیان دەدات، وەکو قاز و مراوی. |
| سباحة | Swimming | شنا، مەلەکردن، خۆشۆردن. |
| سباغيتي | Spaghetti | (سپاگێتی)، جۆرە مەعکەرۆنی‌یەکی باریك و درێژە. |
| سباخ، زبل، سماد | Manure, Stable-litter | زبڵ ، پەینی ئاژەڵ ، تەرسی وولاّخ و تەپاڵەی ئاژەڵ. |

| | | |
|---|---|---|
| سباطة، مزبلة | Dump | زبڵخانە، سەرمنوێلك. |
| سباك، سمكري | Founder , Plumber | تەنەكەچی، فیتەری ئاو، توکمەچی. |
| سباكة، سبك | Founding , Metalcasting | داڕشتن، داڕشتنی کانزا لە قاڵبدا ، تواندنەوە و داڕشتن لە قاڵبدا . |
| سباق، مباراة | Race | پێشبڕکێ، بردان، تاودان، غارغارێن، ڕاکردن. |
| سباق الكيس | Sac race | یاری گونێنی . |
| سباق الخيل | Horse race | غارغارێن، غاراکردن بە چارەوێ، جریدبازی، ڕمبازیی. |
| سباق الحواجز | Steeple-chaser | بازدان بەسەر کۆسپێکدا ( بەسواری وولاخەوە). |
| سبارس، اسبور، نجّار، قجاج، دجاج البحر | Sargo, Sparus | ( سبار)، ( سپارۆس)، مریشکی دەریا، جۆرە ماسییەکی دەریایییە |
| سبات صيفي | Aestivation | سست بوونی هاوینە، مت بوونی هەندێك گیاندار لە هاویندا وەکو سمۆرەی زەوی کە دەچێتە ناو چاڵەوە لە ماوەی گەرما و ووشکانیدا . |
| سبات شتوي | Hibernation | سڕبوونی زستانە، مت بوونی زستانە، وەکو لە گیانداره خوێن ساردەکاندا کە لە زستاندا سڕدەبن، وەکو لە مار و مێروو. |
| سباعي | Seven flod, Hepta, Septan | حەوتە، حەوتی . |
| سباعي الاضلاع، سباعي الزاويا | Heptagon | حەوت لا، حەوت گۆشە . |
| سباع الطير، جوارح | Rapacious, Falconi formes | باڵندەی گۆشت خۆر وەکو باز و هەڵۆ. |
| سبار | Spar | ( سپار)، هەر مادەیەکی کریستاڵی کە کاربۆناتی کالیسیۆم یان سلیکاتی ئەلەمنیۆمی تیادا بێت. |
| سبار ايسلندي | Iceland spar | سپاری ئایسلەندە، جۆرێکی ڕوونە لە کانزای کالیست. |
| سبارتيوم | Spartium | ( سپارتیۆم)، درەختێکە نزیکەی(٣)م بەرز دەبێتەوە ، کێوییە، گەڵاکەی کەمە، لقەکانی سەوز و درێژن، گوڵێکی زەردی بۆن خۆش دەگرێت ، لقەکانی گوشیان لێدروست دەکرێت. |
| سبابة | Fore finger, Index | دۆشاومژە، پەنجەی نێوان پەنجە گەورە و پەنجەیس ناوەڕاست. |
| سبال الخد، سبلة | Whiskers | تووکی ڕوومەت و چەناگە. |
| سبال | Sabal, Palmetto | ( سابال)، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی دارخورما، نزمە، گەڵاکەی لە باوەشێن دەچێت. |
| سبانخ، اسفاناخ | Spinage, Spinach | ( سپێناخ)، ئەسپێناخ، جۆرە گیایەکە لە سلق دەچێت، دەکرێت بە چێشت. |
| سبانخ بنجري | Spinach beet | سپێناخی چەوەندەریی. |
| سبب، علة | Reason, Cause | هۆ. |
| سَبْت، سلة | Basket | سەوەتە، سەبەتە، سەوە، قەرتاڵە. |
| سَبْت، ( يوم) | Saturday | شەممە. |
| سَبت | Tanned-leather | چەرم، پێستیس خۆشە ( دەباغ) کراو. |
| سبت ( السبات) | | بڕوانە ( سبات). |
| سبتليون | Septillion | ( سیپتیلۆن)، ژمارەیەك(٢٤ ) یان (٤٢) خاڵی لە بەردەمدا بێت . |
| سبج | Obsidian, Jet | شەوە، شیا، شووشەیەکی بورکانی ڕەشە، هەندێك جاریش سوور یان قاوەییە . |
| سبجيل، جذر قرنفلي | Spigelia, Pinkroot | (سپیجیلا)، ڕەگە مێخەکی ، گیایەکی کێوی پزیشکییە، بەرەکەی خڕە ، دەرمانی کرمی لێدەردەهێنرێت . |

| | | |
|---|---|---|
| سبحة ، مسبحة | Beads | تەزبیح. |
| سبحية، عقدية، باكتريا سبحية | Strepte-coccus | ( ستریبتۆ کۆکس)، باکتریای تەزبیحیی، جۆرە باکتریایەکە لە شێوەی تەزبیحدا ڕیز دەبێت . |
| سبحيات، ميتوكوندريا، بيوت الطاقة | Mitochondria | ( میتۆکۆندریا)، ماڵی وزە، وزە ماڵە، تەنێکی پێچاوپێچە لە خانەی زیندەوەردا ئەنزیمی تیادایە فرمانەکەی پێداکردنی وزەیە. |
| سبحبح، زنزلخت، ازاد درخت، زلزلخت، جرود | Persiam-lilac, Bead-tree, Chian-tree, China berry, Indian-lilac, Melia | دارتەزبیح، ژەهر ماسی، درەختی ئازاد، درەختێکە گەڵاکانی دەوەرن نزیکەی ( ١٢) م بەرز دەبێتەوە، بۆ سێبەر لە باخچە و شەقامەکاندا دەروێنرێت ، گەڵاکانی ئاوێتەن، گوڵەکانی بە شێوەیەکی هێشوو بە ڕەنگێکی شینی مەیلەو ئەرخەوانین، بەرەکەی خڕ و زەرد و تاڵە، بە قەدەر گوێژێک دەبێت دەنکێکی ڕەشی تێدایە کون دەکرێت و تەزبیحی لێدروست دەکرێت . |
| سبخ | Barren land | زەویی بەیار. |
| سبخة، مالحة | Moorland, Playa, Saline | زەویی شۆرەکات، زەویی خوێیاوی، کە ڕووەکی تیادا نەڕوێت . |
| سبخة ( ارض) | Swamp, Bog, Mire, Marsh | زەلکاو. |
| سبخ | Sopor | نوستنێکی قوڵ، خەوی قورس. |
| سُبَدْ، صَنوع، صقر الليل | Night-jar, Goat sucker, Caprimulgus | فش فشە، جۆرە باڵندەیەکی شەوگەڕە لە کوندەبەبوو دەچێت سپی‌یە و باڵەکانی درێژن، چاوی ڕەشە و دەم و چاوی خڕە پەڕەکەی هێڵدارە ، دەمی گەورەیە و سەر و دەنووکی قووپاوە. |
| سبد اوروبي | Dorhawk | فش فشەی ئەورووپی. |
| سبداج ، سبيداج | White lead, Ceruse | سپیاو، دەرمانێکە بۆ ئارایشت |
| سبرتو، سبيرتو، الكحول | Spirit, Alcohol | ئەلکهول، سپیرتۆ، بە تایبەتی بە ئەلکهولی تەختە ( میثانۆل) دەگوترێت . |
| سبرتو دملوك | Shellac-spirit | سپیرتۆ، دەمەلۆک، بۆیەیەکە لە تێکەڵکردنی (١٠٠)گرام لە ڕەنگی دەمەلۆك لە شووشەیەك سپیرتۆدا دەگیرێتەوە . |
| سبرط | Spart | ( سپارت)، جۆرێکی بچووکە لە ماسی ڕەنکە . |
| سبر، سبر الاعماق | Sounding, Probing | پشکنین، پێوانی قووڵایی ئاوی دەریا . |
| سبراء | Space between two fingers | ناوپەنجە، ماوەی نێوانی دوو پەنجە . |
| سبرين | Suberin | ( سوبرین)، مادەیەکی چەورە لە تەپەدۆردا هەیە. |
| سُبرة، سبر، فرخة الرمال | Glareola-pratincola, Marsh, Harrier, Stone-chot | جۆرە باڵندەیەکی گۆشت خۆرە لە واشە گەورترە، ڕەنگەکەی خۆڵەمێشی‌یە. |
| سبرغولة ، قليقلة | Spurry, Spurrey | ( سپەری)، گیایەکە لە کۆمەڵەی مێخەك، گوڵەکەی سپی‌یە. |
| سبروليت | Sprolite | ( ساپرولیت)، بەردێکی نەرمی داڕزاوە . |
| سبرمية، الحمى النتنة | Sapremia | ( ساپریمیا)، جۆرێکە لە ژەهراوی بوونی خوێن. |
| سبرماتين | Spermatin | ( سپێرماتین)، مادەیەکی لینجی بۆندارە لە تۆوی ( ئاوی) پیاودا هەیە. |
| سبسيد، ذباب التعفن | Sepsidae | ( سیپیدا)، مێشێکی بچووکی ڕەشە لەناو شتومەکی ڕزیودا گەرا دادەنێت . |
| سبستان، دبق ، مخاطة، مخيطة، اطباء الكلبة | Sebesten, Syrian plum | داری دەموکانە، داری دەمکانە، درەختێکە بەرێکی لینجی هەیە، دەخورێت یان بۆ گرتنی باڵندە بەکاردێت. |
| سبسب، تفا، تفة، عناق الارض | Lynx, Caracal | پشیلەی کێوی، ڕۆدەك، وشەك. |

| | | |
|---|---|---|
| سبساج | Sapsago | ( ساپساگۆ)، جۆرە پەنیرێکی ڕەقی مەیلەو سەوزە. |
| سَبِط (شعر) | Lank, Softand, Straight (hair) | قژی ساف، قژی خاو. |
| سبِط | Tribe | پۆل، هۆز. |
| سَبط | Friars cowl | ڕووەکێکە لە چیمەن دەچێت بۆ لەوەڕ باشە . |
| سبطانة، ماسورة ، البندقية | Gun barrel | لوولە، لوولەی تۆپ و تفەنگ. |
| سُبُع | Seventh part | حەوت یەك. |
| سَبع | Beast of prey | گیانداری دڕندە، هەر گیاندارێك دڕندە بێت . |
| سبُع، اسد | Lion | شێر. |
| سبع ، فهد، ذئب | Lupus, the wolf | گورگ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| سبع البحر، اسد البحر، فظ | Sea lion | شێری دەریا. |
| سبع البحر، قيطس | The sea monster, Cetus, The whole | شێری دەریا، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| سبعة | Seven | حەوت، حەفت . |
| سبع الجبل، اسد الجبل | Puma | ( پوما)، شێری شاخی، شێری کێوی. |
| سبع الليل، كلب | Dog | سەگ. |
| سبعة عشر | Seventeen | حەڤدە. |
| سبعون | Seventy | حەفتا. |
| سبك | Found, Cast | داڕشتن، داڕشتنی چەند کانزایەك لە قاڵبدا . |
| سبكترو، طيف | Spectro | ( سپێکترۆ)، پێشگرێکە بە مانای شەبەنگ. |
| سبكتروفوتومتر | Spectro-photometer | ( سپێکترۆفۆتۆمەتر)، ئامرازێکە بۆ پێوانی تینی ڕووناکی لە نێوان بەشە جیاوازەکانی شەبەنگدا . |
| سبكتروفوتومترية | Spectro-photometry | سپێکترۆفۆتۆمەتری، پێوانی شەبەنگی ڕووناکی ڕێگەیەکی ڕووناکییانەیە لە شیکردنەوەی کیمیایدا بەکاردێت. |
| سبكتروغرام | Spectogram | ( سپیکترۆگرام)، وێنەی شەبەنگی. |
| سبكترولوجيا، علم التحليل الطيفي | Spectrology | ( سپێکترۆلۆجی) ، زانیاری شیکردنەوەی شەبەنگ. |
| سبكترومتر | Spectrometer | ( سپێکترۆمەتر)، پێوەری شەبەنگ. |
| سبكتوغراف ، مرسمة الطيف | Spectrograph | ( سپێکترۆگراف)، وێنەگری شەبەنگ. |
| سبكتروغراف كتلي، مرسام الطيف الكتلي | Masspectrograph | ( سپێکتۆگراف بارستەیی)، دەزگایەکە بۆ جیاکردنەوەی ئەتۆم ( گەردیلە) و مۆلیکیولی ( گەردی) بارگەکراو و ئەو تەنۆکە جیاکراوانە بە ڕێگەیەکی فۆتۆگرافی تۆمار دەکات . |
| سبكتروهيلوغراف | Spectro-heliograph | ( سپێکترۆهیلیۆگراف)، دەزگای پیشاندانی شەبەنگی خۆر. |
| سبكتروسكوب، مطياف، منظار التحليل الطيفي | Spectroscope | ( سپێکترۆسکۆپ)، دووربینی شەبەنگی، جۆرە دووربینێکە بۆ بینین و خوێندنەوەی شەبەنگی ڕووناك بە تایبەتی ئەو شەبەنگەی بە شێوەی هێڵ بێت. |
| سبكتروهيلوسكوب، مرقب الطيف الشمسي | Spectro-helioscope | ( سپێکترۆهیلیۆسکۆپ)، ڕوانگەی شەبەنگی خۆر. |
| سبلول | Sabalol | ( سابالۆل)، مادەیەکە لە دارخورمای سابال دەردەهێنرێت |

| | | |
|---|---|---|
| سَبَل، ظفرة | Pannus | تانەی سەر چاو. |
| سَبَل، سنبلة | Ear of corn, Spike, Style | گوڵەجۆ، گوڵەگەنم ، گوڵە گەنمەشامی. |
| سبلة ، كاس | Sepal | كاسەی گوڵ، گەڵای كاسەی گوڵ كە سەوزە. |
| سبنيلي | Spaniel | ( سپانيل)، سەگێكی بچووكی پەل كورتە. |
| سبنيت | Spinets | ( سپاينيت)، ئامرازێكی مۆسيقای كۆنە لە پێناو دەچێت. |
| سبوقة، خابور، بيلسان اسود، خمان، دمدمون، سمبوقة، سنبوقة | Sambucus | ( سامبوكەس)، دەوەنێكە گوڵەكەی بە شێوەی هێشووە، بەرەكەی لە ترێ دەچێت گوڵەكەی پزيشكی و بۆن خۆشە . |
| سبودومين | Spodumene | ( سپودۆمين)، بەردێكی بەنرخە بريتی‌يە لە سليكاتی ئەلەمنيۆم و ليثيۆم رەنگەكەی سپی يان خۆڵەمێشی يان سەوزە يان ئەرخەوانی‌يە لە دروستكردنی شووشەدا بەكاردێت . |
| سبوتنيك، قمر صناعي | Sputnik | ( سپۆتنيك)، مانگی دەست كرد. |
| سبور، اردواز | Slate | ( سلێت)، تاوێر، بەردێكی تەڕی توێ توێ تۆيیە رەنگەكەی خۆڵەمێشی‌يە. |
| سبوروزوا | Sporozoa | ( سپۆرۆزوا)، گياندارێكی يەك خانەيی‌يە ئەندامی جووڵەو خواردنی نی‌يە. |
| سبورة | Black board | تەختەی رەش بۆ نوسين . |
| سبوريات | Sporozoa | ( سپۆرۆزوا)، گياندارە سپۆری‌يەكان كە توانای جووڵان و خواردنيان نی‌يە بە شێوەی مشەخۆر دەژين. |
| سبوروزويت | Sprozite | ( سپۆرۆزۆيت)، سپۆری جووڵاوە. |
| سبوروفايت | Sporophyte | ( سپۆرۆفايت)، بەرەی، وەچەی، سپۆری. |
| سبوس، ساجو | Cebus, Sajou | ( ساجۆ)، جۆرە مەيموونێكە. |
| سبوتة، اخراس امريكي، زعرور امريكي | Sapote, Sapodilla | گوێژی ئەمەريكی، درەختێكی گەورەيە گوڵەكەی وەكو زەنگوڵەی سپی‌يە، بەرەكەی خڕ يان هێلكەيی‌يە هێندەی پرتەقاڵێكی بچووك دەبێت ناوكەكەی پرتەقاڵی مەيلە و سوورە و زۆر شيرينە . |
| سبول، ثوم قصبي | Welsh-onion | سيری قاميشی، رووەكێكی سەلكدارە لە كۆمەڵەی نێرگز ، گوڵەكەی سپی مەيلە و سەوزە لە شێوە و تامدا لە سير دەچێت ، بەڵام سەلكی نی‌يە . |
| سبيدج، حُبار ، سيبيا، صبيدج | Cuttle fish, Sepia, Squlds | (سيپيا)، مەرەكەب وەشێن، گياندارێكی دەريايی نەرمە لە ئەختەبووت (هەشت پێ) دەچێت دەخورێت، شلەيەكی قاوەيی تۆخ دەردەدات بۆ پارێزگاری خۆی لە مەرەكەب دەچێت . |
| سبيل | Way, Road | رێگا، رێگە، رێ. |
| سبيكة، اشابة | Alloy, Ingot | دارشتە ، دارێژراو، ئەميژين، تێكەڵاوێكی رەق يان شلە لە دوو كانزا ( ميتاڵ) يان زياتر يان چەند كانزا و ناكانزايەك بۆ مەبەستی لابردنی هەندێ رەوشت لە كانزا سەرەكی‌يەكەدا، بۆ نموونە زێڕ كانزايەكی بەنرخە، بەڵام نەرمە لەبەر ئەوەی مسی تێدەكرێت . |
| سبيكة ديلتا | Delta alloy | دارشتەی ( دێلتا)، بريتی‌يە لە دارشتەی مس و توتيا و ئەلەمنيۆم و ئاسن و مەنگەنيز بۆ دروست كردنی مۆتۆری پاپۆڕ بەكاردێ. |
| سبيكة المرايا المعدنية | Speculum-metal | دارشتەی ئاوێنەی كانزايی. |
| سبيكة لحام | Solder | دارشتەی لەحيم_ جۆش). |
| سبيكة المونيل، فلز المونيل | Monel alloy, Monel metal | دارشتەی ( مۆنيل)، بريتی‌يە لە دارشتەی مس و نيكل بۆ دروستكردنی ئامرازی ئامادەكردنی مادەی كيميای بەكاردێت . |

| | | |
|---|---|---|
| سبيكة روز | Ross metal | دارشتەی ( رۆز)، دارشتەیەکە بیزموت و قورقوشم و تەنەکەی تیادایە. |
| سبيكة سهلة الانصهار | Fusible alloy | دارشتەیەک کە بە ئاسانی بتوێتەوە، بە شێوەیەکی ئاسایی بزموت و قورقوشم و تەنەکەی تیادایە |
| سبيكة بليون | Bullion | دارشتەی بلیۆن، دارشتەیەکە لە زێڕ یان زیو بە شێوەی تۆپەڵ یان شیشی دارێژراو. |
| سبيكة كونستانتان | Constantan | دارشتەی کونستانتان، بریتییە لە دارشتەی مس و نیکل بۆ دروستکردنی ئامرازی کارەبایی بەکاردێت. |
| سبيكة النحاس الأحمر | Red brass | دارشتەی مسی سوور، مس و توتیای تیادایە. |
| سبيكة راني | | دارشتەی رانی، دارشتەیەکە لە ٣٠٪ نیکل و ٧٠٪ ئەلەمنیۆم بۆ گۆڕینی نیترات بۆ نەوشادر بەکاردێت. |
| سبيكة وود | | دارشتەی ود، دارشتەیەکە لە قورقوشم و بزموت و تەنەکە و کادمیۆم بۆ دروستکردنی بۆریی ئاگرکوژاندنەوە بەکاردێت لە ناو خانوودا. |
| سبيكة بابيت، معدن بابيت | Babbit metal | دارشتەی بابیت، کانزای بابیت، تێکەڵاوێکی سپییە، دژی کراندن بەکاردێت لە مس و ئەنتیمۆن و تەنەکە پێکهاتووە. |
| سبيكة الجرس، فلز الجرس | Bell metal | دارشتەی زەنگ، دارشتەیەکی رەقە لە مس و تەنەکە پێکهاتووە. |
| سبيب | Coarse hair | چار، تووکی ئاوچەوان یان باڵی وڵاخ. |
| سبيخة، نسيل | Lint | شاش، شاشی برین پێچانەوە. |
| سبيبة، واق ابيض | Boat bill, White night-heron | شاهۆی سپی، جۆرێکە لە شینەشاهۆ. |
| سبيطر، بلشون جبار | Giant-heron | جۆرە شینەشاهۆیەکی گەورەیە. |
| سبيداج | | بڕوانە (سبداج). |
| سبيروغراف، مرسمة التنفس | Spirograph | (سپیرۆگراف)، وێنەگری هەناسەدان. |
| سبيرومتر، مقياس التنفس | Spirometer | (سپیرۆمیتەر)، پێوەری هەناسەدان. |
| سُبيلة، ذنب الثعلب | Meadow, fox tail | کلکەرێوی، جۆرە گیایەکە بۆ لەوەڕ باشە. |
| سبيتز | Spitz | (سپیتز)، سەگێکی بچووکی تووک درێژی لموز باریکە. |
| سبيناغ | | بڕوانە (سبانخ). |
| سبينة، ابهل | | بڕوانە (ساپین). |
| سبيرموفيل، يحبوب | Spermeophile | (سپێرمۆفیل)، گیاندارێکی قرتێنەرە. |
| سُبية، بنج | Bang, Bangue, Opium | بەنگ، تلیاک، حەشیشە، شلەیەکی سەرخۆشکەرە. |
| سبينت | Spinet | (سپینیت)، ئامرازێکی مۆسیقایە لە پیانۆ دەچێت. |
| سبيخة، قطن طبي | Medical cotton | لۆکەی پزیشکی. |
| سبيرتو، كحول الخشب | | بڕوانە (سبرتو). |
| سبينثاريسكوب، منظار اشعة الفا | Spinthariscope | (سپینثاریسکۆپ)، دووربینی تیشکی ئەلفا، ئامرازێکە بۆ دۆزینەوەی شوێنەواری تەنۆکەی ئەلفا. |
| سبينل، سباينل | Spinel, Spinelle | (سپاینیل)، بەردێکی بەنرخە مەگنیسیۆم و ئەلەمنیۆم و ئۆکسجینی تێدا. رەنگەکەی یان سوور یان شینە. |
| سبيريلايت | Sperrylite | (سپیریلایت)، مادەی دووەم زەرنیخیی پلاتین رەنگەکەی سپی مەیلەو خۆڵەمێشییە. |
| ست، خاتون | Lady | خانم، خاتوون، بانوو. |
| ستاديومتر | Stadiometer | (ستادیۆمەتر)، ئامرازێکە بۆ پێوانی درێژیی هێڵە چەماوەکان. |

| | | |
|---|---|---|
| ستابيلية | Stapelia | (ستاپيليا)، ڕووەكێكە بۆنی گوڵەكەی بۆگەنە. |
| ستارة | Curtain, Screen, Vallum, Scense, Veil | پەردە. |
| ستار الوقاية، مصدات الريح | Shelter belt | پەرژینێك لە دارودەوەن بۆ مەبەستی پاراستنی شوێنێك لە كاری ڕەشەبا و بەفر و خۆر هتد. |
| ستارة متفلورة | Fluorescent screen | پەردەی فلوریسێنت، لەوحێكی كانزاییە لە ناوچەی بینراوی شەبەنگدا تیشك دەداتەوە ئەگەر بدرێتە بەر تیشكی ئێكس یان تیشكی ئایۆنراو. |
| ستاتوسكوب | Statoscope | (ستاتۆسكۆپ)، بارۆمەترێكی بێ شلەیە بۆ پێوانی گۆڕانی كەم لە پاڵەپەستۆی هەوادا بەكاردێت. |
| ستاتيك، سكونيات، علم السكون | Statics | (ستاتیك)، زانیاری وەستان، لقێكە لە زانیاری میكانیك باسی تەنە وەستاوەكان و هێزە هاوسەنگەكان دەكات. |
| ستاتيكا مائية | Hydrostatics | هایدرۆستاتیك، ئەو زانیارییەی كەباسی كاری هێزەكان دەكات بەسەر شلەكاندا، كاتێك كە ئەو شلانە لە باری وەستاندا بن. |
| ستاتيكية الهواء | Aerostatics | ستاتیكی هەوا، وەستانی هەوا. |
| ستام ئيف ٣٤ | 34 | (ستام ئیف ٣٤)، قەلاچۆكەرێكی خاوێنكەرەوەیە بۆ لەناوبردنی گژ و گیا و دەغڵی كێڵگەكان بەتایبەتی دەغڵی ناو مەرەزە، وەك داروجان، لە پاش چەكەرەكردنی چەڵتووكەكە ئەو دەرمانەی پێوەدەكرێت. |
| ستارة المطاردة، ستارة الصيد | Hunting screen | دیۆجامە، پەردەیەكی ڕەنگاوڕەنگە ڕاوكەر لەكاتی ڕاوكردندا بەكاری دێنێت. |
| ست الحسن، بيلادونا، عنب الثعلب | Bane wort, Belladonna, Deadly night shade, Atropia, Dwale | ڕەزڵە، تووڵەزەرە، ترێ مارانە، ڕووەكێكە لە كۆمەڵەی باینجان بەلەدۆنا، مادەیەكی سڕكەری تێدایە (ئەترۆپین) بە شێوەی دەرمان بەكاردەهێنرێت. ڕەگەكەی ئەستوور و گۆشتنە گوڵەكەی پەمەیی و مەیلەو زەردە، بەرەكەی لە ترێ دەچێت سوورە دوایی ڕەش دەبێت، ژەهرینە. |
| ستايشن، ستيشن | Station wagon | (ستێشن)، جۆرە ئۆتۆمبیلێكە بۆدییەكەی گەورە و چەند ڕیزێك كورسی تێدایە. |
| ستافيلوكوكس | Staphyloccus | (ستافیلۆكۆكەس)، جۆرە میكرۆبێكی خڕە. |
| ستالاكتايت، هوابط | Stalactite | (ستالاكتایت)، بریتییە لە بەردی قسڵ بە شێوەی چلوورە لە بنمیچی هەندێك ئەشكەوتی شێدارەوە شۆڕ دەبێتەوە خوارەوە، دیمەنێكی جوانی هەیە. |
| ستالاكمايت، صواعد | Stalagmite | (ستالاگمایت)، بریتییە لەبەردی قسڵ بەشێوەی چلوورە لە زەویی هەندێك ئەشكەوتی شێدارەوە بەرز دەبێتەوە، دیمەنێكی جوانی هەیە. |
| ستايرين | Styrene | (ستایرین)، ئاوێتەیەكی هایدرۆكاربۆنیە، ئەڵقەیەكی بەنزۆل و بەندێكی ناتێری تێدایە. |
| ستانيت، بايريت القصدير، خام فلز الجرس | Stannite | (ستانیت)، كەرەسەیەكی خاوە، گۆگرد و ستانەم (تەنەكە) و مس و ئاسن و هەندێك جار توتیای تیادایە. |
| ستة عشر | Sixteen | شانزە، شانزدە، شازدە. |
| ستة | Six | شەش. |
| ست خديجة، وزال الشرق | Rushbroom, Spanishroom | خەجیج خان، خاتوو خەجیج، دەوەنێكی دەشتەكی ڕازاندنەوەیە گوڵەكەی بە شێوەی هێشووی بۆن خۆشی گەورەیە. |
| ستريوتومية | Stereotomy | ( ستیریۆتۆمی)، هونەری بڕینەوەی بەرد بە شێوە و قەبارەی تایبەتی . |
| سترات | Citrate | ( سیترەیت)، خوێی ترشی سیتریك. |

| | | |
|---|---|---|
| ستريوسكوبية | Stereoscopy | ( ستێریۆسکۆپی)، بینینی سیٚ دووری . |
| ستريوسكوب | Stereoscope | ( ستریۆسکۆپ)، دووربینی پوازکی تەنداکەر، ئامرازێکە وێنەی شتومەکی بە شێوەیەکی تەنداری ئاشکرا تیا دەبینرێت. |
| ستر، حجاب | Veil, Screen | پەردە. |
| ستر، غطاء | Covering | سەرپۆش، ڕووپۆش. |
| ستريوسكوبية، مجسامية | Sterescopy | تەندارێتی، بینینی سیٚ دووری بە جارێك . |
| ستراس | Strass | ( ستراس)، جۆرە شووشەیەکی بریسکەدارە بۆ دروستکردنی گەوهەری درۆزنە بەکاردێت. |
| سترة، جاكيت | Coat, Jacket | چاکەت، شەپك. |
| سترة،قباء | Outer garment | کەوا، کوجەڵە، کورتەك. |
| سترة طويلة | Long jacket | مرادخانی ، چاکەتێکی درێژ. |
| سترة قصيرة | Short Jacket, Spencer | تەکمە، چاکەتێکی کورت. |
| سترة لباد | Felt jacket, Matted | پەستەك، کەپەنك. |
| ستروبوسكوب | Stroboscope | ( سترۆبۆسکۆپ)، ئامرازێکە بۆ پێوانی خێرایی سووڕانەوە و لەرینەوەی تەنەکان . |
| سترومايريت | Stromeyerite | ( سترۆمایریت)، کەرەسەیەکی خاوە ( مەعدەنێکە). |
| ستريوغرافيا، تصوير مجسامي | Stereography | ( ستێریۆگراف)، هونەری وێنەگرتنی تەنە ڕەقەکان لەسەر ڕوویەکی تەخت . |
| ستريو، ستيريو | Stereo | ( ستێریۆ)، تەندار. |
| ستيريوبيتكون | Stereopticon | ( ستریۆپتیکۆن)، جۆرێکە لە فانۆسی سیحری، چرای جادوگەری. |
| ستراتوسفير، غلاف زمهريري | Stratosphere | ( ستراتۆسفیر)، بەرگی ئەتمۆسفیری. ( کەش)، چینی دووەم لەو بەرگە هەوایەی کە دەوری گۆی زەوی داوە، پاڵەپەستۆی هەوای تێدا کەمە بۆ ماوەی نزیکەی (٦) میل درێژ دەبێتەوە، ئەو چینە هەوایە کە نیزکەی (١١) کم بەرزە لە ڕووی زەوییەوە ، هەور و تەپەتۆز و هەڵمی ئاوی تێدا نییە، زۆر ساردە . |
| سترونتيوم | Strontium | ( سترۆنتیۆم)، توخمێکی کیمیاییە کێشی ئەتۆمییەکەی (٦٢،٨٧) و ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٣٨) کانزایەکی سپی زیوییە مانای ناوەکەی لە وشەی ( سترۆنتین) واتە ئوسکوتلەندە وەرگیراوە نیشانەکەی (Sr). |
| سترونجيل | Strongyle, Strongle | ( سترۆنجیل)، جۆرە کرمێکی خڕە، نەخۆشی پەیدا دەکات . |
| سترونتيا، اوكسيد السترونتيوم | Strontia | ( سترۆنتیا)، ئۆکسیدی سترۆنتیۆم، تۆزێکی سپی خۆڵەمێشییە، لە دروستکردنی بۆیە و دەرمان و سابووندا بەکاردێت . |
| ستروفانتوس | Strophanthus | ( سترۆفانتەس)، دەوەنێکە لە ناوچە گەرمەکانی ئەفریقا دەڕوێت . |
| ستروفانتين | Strophanthin | ( سترۆفانتین)، مادەیەکی ژەهرینی تاڵە لە تۆوی درەختی سترۆفانتەس دەردەهێنرێت بۆ ووریاکردنەوەی دڵ باشە . |
| ستراتيجرافية | Stratigraphy | ( سترانیگراف)، زانیاری باسکردنی چینەکانی زەوی. |
| ستربتوكوكس | Streptococus | ( ستریپتۆکۆکەس)، میکرۆبێکی خڕە بە شێوەی تەزبیح ڕیز دەبێت . |
| ستربتومايسين | Streptomycin | ( ستریپتۆمایسین)، دەرمانێکە دژی باکتریای نەخۆشی بەکاردێت . |
| سترجيون، حفش | Sturgeon | ( ستەرجیۆن)، ماسییەکی گەورەیە گەراکەی پیٚ‌دەگوترێت ( کاڤیار) بۆ خواردن بەکاردێت . |

| | | |
|---|---|---|
| سترونتینیت | Strontianite | ( سترنتینیت)، یەکێکە لە کەرەسە خاوە گرنگەکانی کانزا ( میتاڵ) ی سترونتیۆم بە شێوەی کاربۆناتی سترۆنتیۆم بێڕەنگ یان سپی یە یان خۆڵەمێشی یان سەوز لە دروستکردنی فیشەکەشێتەدا بەکاردێت . |
| سترکولیا | Bottle tree | درەختی بۆتڵ، لە بوتڵ دەچێت ، درەختێکی هەمیشە سەوزە یان گەڵا وەریوە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت . |
| ستریوبتکیون | Stereopticon | ( ستیریۆپتیکۆن) ، جۆرێکە لە چرای جادووگەر ( الفانوس السحری) . |
| ستریکنین | Strychnine | ( ستریکنین)، دەرمانێکی زۆر ژەهرینە لە توێکڵی درەختێکی تایبەتی (گوێزی ڕشێنەوە) دەردەهێنرێت. |
| ستریکنوز، جوز القيء | Nuxvomica | ( ستریکنۆز)، وێزی ڕشێنەوە دار و دەوەنێکی کەپرییە بەرەکەی خڕە دەنکەکەی هەندێك دەرمانی ژەهری لێدەردەهێنرێت وەکو ( ستریکنین). |
| سترین، توباز کاذب، توبازکوارتزي | Citrine | ( سترین)، بەردێکی بەنرخە ڕەنگەکەی لە ڕەنگی لیمۆ دەچێت . |
| ستل، نسر، نسر ابو ذقن، بلح | Vulture, Neophron | ( نیوفرۆن) ، جۆرێکە لە سیسارکە کەچەڵ ، داڵی کەرخۆر. |
| ست مستحية | Sensitive plant, Mimosa | ( میمۆسا)، ڕووەکی شەرمن، جۆرێکە لە ڕووەك، ئەگەر دەست لە گەڵاکانی بدرێت لوول دەبن . |
| ستوكيومترية، ستيجومترية، حسابات ضبط المقادير | Stoichiometry | ستۆیکیۆمەتری، لقێکە لە زانیاری کیمیا باسی چۆنیەتی و دابینکردنی (دەست بەسەراگرتنی) بڕی ئەو مادانە دەکات کە بەشدار دەبن یان دێنە بەرهەم لە کارلێکە کیمیاییەکاندا. |
| ستون | Sixty | شەست . |
| ستوجي | Stogy | ( ستۆجی)، جۆرە جگەرەیەکی درێژی باریکی هەرزانە. |
| ستول، طابورة | Stool, Tabouret | ( ستوول)، هەر کورسییەکی بچووکی بێ پاڵپشت و تەنیشت . |
| ستولزيت | Stolzite | ( شتۆلزیت)، یەکێکە لە کەرەس خاوەکانی تەنگستن و بریتییە لە تەنگستاتی قورقوشم ، ڕەنگەکەی سووری مەیلە و قاوەیی یان خۆڵەمێشی یان زەرد یان سەوزە. |
| ستوروليت، ستاوروليت | Staurolite | ( سترۆلیت)، بەردێکە بریتییە لە سلیکاتی ئاسن و ئەلەمنیۆم و مەگنسیۆم ، ڕەنگەکەی سووری مەیلەو قاوەی یان قاوەیی مەیلەو ڕەشە. |
| ستوديو | Studio | ( ستۆدیۆ)، (١) شوێنی نیشکردنی وێنەگر و پەیکەرتاش (٢) شوێنی گرتنی فلیمی سینەما. |
| ستوك | Stoke | ( ستۆك)، یەکەی پێوانی لینجی کیمیایی ( بە سانتیمەتر لە چرکەیەکدا) . |
| ستومايكس | Stomyxis | (ستۆمایکس)، جۆرە مێشێکی خوێن مژە . |
| ستوراكس، ستيراكس | Storax, Styrax | ( ستۆراکس)، جەویی شل کە لە توێکڵی درەخت دەردەهێنرێت . |
| سيتاريل | Stearyl | ( ستیاریل)، کۆمەڵەیەکی ( ڕەگێکی) کیمیاییە لە ترشی ستیاریکدا هەیە . |
| ستياري | Stearic | ستیاری، چەوری، بەزیی، پیوی. |
| ستيارات | Stearate | ستیارات، خوێی ترشی ستیاریك. |
| ستيارات الصوديوم | Sodium stearate | ( ستیاراتی سۆدیۆم)، جۆرێکە لە سابوون . |
| ستيارات الكليسريل | Glyceryl stearate | ستیاراتی گلیسریل، مادەیەکی کیمیاییە . |
| ستيلوسكوب | Steeloscope | ( ستیلۆسکۆپ)، ئامرازێکی شەبەنگییە بۆ دۆزینەوەی چۆنیەتی پێکهاتنی پۆڵا. |
| ستيرين | Styrene | ( ستایرین)، مادەیەکی هایدرۆکاربۆنی شلی ئاتێری بۆن خۆشە لە دروستکردنی لاستیك و پلاستیکدا بەکاردێت . |

| | | |
|---|---|---|
| ستير | Stere | ( ستێر)، یەك مەتر شەش گۆشە . |
| ستيرول | Sterol | ( ستیرۆل)، مادەیەكی ئەلكهولی رەقە لە پێكهاتنی گەلێك لە ڤیتامینەكان و هۆرمۆنەكاندا بەشدارە لە لەشی گیاندار و رووەكدا هەیە وەكو كولسترۆل كە لە لەشی گیانداردا هەیە. |
| ستيبينيت، الانتمون البراق | Stibnite, Amtimony glance | ( ستیبینید)، یەكێكە لە كەرەسە خاوەكانی ئەنتیمون ( كل) بە شێوەی گۆگردیدی ئەنتیمون رەنگەكەی خۆڵەمێشی بریسكەدارە . |
| ستينبوك، مها | Stenbock | مانگا كێوی. |
| ستيفانيت | Stephanite | ( ستیفانیت)، یەكێكە لە كەرەسە خاوەكانی ئەنتیمۆن ( كل) و زیو بریتی یە لە گۆگردیدی ئەنتیمۆن وزیو ، لە مەكسیكۆ كۆلۆرادۆ هەیە ، رەنگەكەی خۆڵەمێشی مەیلەو رەشە . |
| ستيريو | | بڕوانە ( ستریۆ) . |
| ستيبين | Stibine | (ستیبین)، ( ئەنتیمۆن هایدرید) ، گازێكی ژەهر و بێ رەنگە زوو شی دەبێتەوە . |
| ستيلبين | Stibene | ( ستلبین)، مادەیەكە لە دروستكردنی بۆیەدا بەكاردێت . |
| ستيارين، دهنين | Stearin, Stearine | ( ستیارین)، مادەیەكی بێ بۆن و بێ رەنگە، جۆرە رۆنێكە لە بەز و پیوی گیاندار دەردەهێنرێت. لە دروستكردنی سابوون و مۆم و مادەی لكێنەردا بەكاردێت . |
| ستينسل، روسم | Stencil | ( ستێنسڵ)، تەبەقێكی تەنەكە لە كانزا یان كاغەزی مقەبا یان كاغەزی موشەما، نوسین و وێنەی لەسەر چاپ دەكرێت. |
| ستير، فالوس | Phallus mushroom | ( فالوس)، شاخی دێو، جۆرە قارچكێكە. |
| ستيرين | Styrene | ( ستیرین)، مادەیەكی هایدرۆكاربۆنی شلی بۆن خۆشە لە دروستكردنی لاستیك و پلاستیكدا بەكاردێت . |
| ستيكوسور، ستيجوسور، اسطخور | Stegosaurus | ( ستیگۆسۆر)، جۆرە گیاندارێكی دینۆسۆری كەتەی گیا خۆری قڕتێكەوتووە، قەڵغانێكی دركاوی بەسەر پشتەوە بووە. |
| ستيجومية | Stegomia, Tiger-mosquito | ( ستیگۆمیا)، جۆرە مێشولەیەكە نەخۆشی بلاودەكاتەوە . |
| ستينية، ساتينية | Sateen | چنراوێكی ( قوماشێكی) لوكەیە. |
| ستابيت | Stillbite, Desmine | ( ستیلبیت)، بەردێكە بریتی یە لە سلیكاتی سۆدیۆم و كالسیۆم و ئەلەمنیۆمی ئاوی ، رەنگەكەی مەیلەو زەرد ، پەمەیی یان سوورە. |
| سجادة، طنفسة | Carpet, Rug | قاڵی ، مافوور، فەرش، بەرە، راخەر، رایەخ، ژێرەخەر، قالیچە. |
| سجادة الصلاة، مسجدة | Prayer-rug | بەرماڵ، دووگرد. |
| سجادة كبيرة | Carpet | وەرتە، ئۆرتە، قاڵیی گەورە. |
| سجادة صغيرة | Scatter rug | قاڵیچە. |
| سجاج، سياع | Coating | سواغ دان . |
| سجال | Jug | دۆڵكەی ئاو، سوراحی. |
| سجاف | Diaphragm | ( دایەفرام)، رێكخەری كونی رووناكی لە كامێرادا . |
| سجاف | Fimbria | توێژاڵ، ریشوو، كوڵك. |
| سجاف مبيضي | Ovarian fimbria | ریشووی هێلكەدان لە مێینەدا . |
| سجان | Jailer, Gaolor, Jallor, Turn key | وەردیان، پاسەوانی بەندیخانە. |
| سجح | Dysentery | زەحیری، دیزانتری. |

| | | |
|---|---|---|
| سجريق، ارجوان، زمزريق | Red bud, Judas tree, Love tree | ئەرخەوان، بروانە ( ارجوان) . |
| سجس، امذاء، احتلام، خضخضة | Pollution | شەیتانی بوون، ئاوهاتنەوە بەدەم خەوەوە. |
| سجع ( الحمام) | Cooing | گمەی کۆتر، خوێندنی کۆتر. |
| سجف ، ستار | Curtain, Fringes | پەردە. |
| سجف | Madrass | مێزەر، سەروپێچ، پارچە قوماشێکی رەنگاورەنگە لە سەرەوە دەپێچرێت. |
| سجق، مقانق، نقانق | Sausage, Savelory | ١. سجوق، شیرینییەکە لە دۆشاو و گوێز و ئارد دروست دەکرێت وە دەکرێت بە پەتەوە.<br>٢. گیپەی شیلاوك، گیپەی رێخۆڵە، یان هەر خواردەمەنییەکی ووشککراوە بەماراتی پێوەکرا بێت. |
| سجق، منبار، لقنق، نقانق | Allantiois | بەشێکە لە لەشی بەرخۆلەی گیاندارە برپەدارە بالأکان فرمانی هەناسە و خۆراك دەبینێت . |
| سجق الدبس، مقانق | Treacle sausage | سنجوق، سجوقو جۆرێکە لە شیرینی لە دۆشاوی وشك و گوێز دروست دەکرێت. |
| سجل | Voluminous uder | مەمکی زل ، گوانی زل. |
| سجل | Register | دەفتەرێکە داوا و بریار و چەك و کاروباری کرین و فرۆشتن و ناو و ژمارەی شتومەکی تێدا دەنوسرێت و هەڵ دەگیرێت . |
| سجل | Archive, record | تۆمار |
| سجل الشرف | Record of honour | تۆماری شانازی ، تۆماری میوانداری، تۆماری شکۆمەندی. |
| سجل المساحة | Cadastre | تۆماری زەوی پێوان، تۆمارێکە ناوی ئەو زەوییانەی تێدا تۆمار دەکرێت کە پێوراون، سنوور و ناوی خاوەنەکانیانی تیادا نوسراوەتەوە . |
| سجل | Coast clubrush | زەلی کەنار، زەلی کەناری ئاو . |
| سجل اسود ، قائمة سوداء | Black book | تۆماری رەش، تۆمارێك یان دەفتەرێك ناوی ئەو کەس و کۆمپانیانەی تیا دەنوسرێت کە خراپەیان کردبێت . |
| سجلات، قیود | Archives | ئەرشیف، دەفتەری تۆمارکردنی دەنگوباس و زانیاری ناياب. |
| سجل الوفیات | Necrology | سجلی مردووان، تۆماری مردووان. |
| سجلول | Scagliola | ( سەجلول)، جۆرە مەرمەرێکی درۆزنەیە. |
| سجلاط | Arabian jasmine | یاسەمین، گوڵەکەی ئیواران دەکرێتەوە و بەرەبەیان دادەخرێت . |
| سجمي | Sigmoid | سیگمی، پێچ، پێنێك لە شێوەی پیتی (S) دا. |
| سجن | Prisom, Jail | زیندان، بەندیخانە. |
| سجنجل، مراة | Mirror | ئاوێنە. |
| سجنجر، رجل الدجاجة الشوکي | Acanthodactylus, Bosklauus | پێ‌مریشکەی دڕکاوی، جۆرە رووەکێکە . |
| سجور | Stick, Timber | چیلکەی سووتەمەنی. |
| سجیة، طبعس، خلق | Temper, Character, Trait | رەوشت، خوو، سیفەت، تووزم. |
| سجیل | Shale, Marl | ١. تەلأشە بەردن<br>٢. هەرکێلگ رادەی بەردی تێدا زۆر بێ. |
| سجیل | La Pilli, Cinders | تەلەزمە بەردێکی بورکانییە هێندەی دەنکە نۆکێك یان گوێزێك دەبێت . |

| | | |
|---|---|---|
| سجي، مسجون | Prisoner | بەند، دیل،سی گیراو، زیندانی. |
| سح، سحوح | Fattening | قەڵەوکردن. |
| سحاءة، سحاية، سحايا | Meninges, Meninx | پەردەی مێشك، بریتییە لە سێ پەردە دایکە (مادە) رەقە و جا: |
| سحائي | Meningeal | شتێك پەیوەندی هەبێت بە پەردەی مێشکەوە . |
| سحاب | Zipper | زنجیر، ئەو زنجیرەی دەکرێت بە کراس و پانتۆڵەوە بۆ د |
| سحابة ، سحاب | Cloud | هەور، ئەڤر. |
| سحابتا ماجلان | Magellanic clouds | جووت هەورەکەی ماجەلان، دوو کۆمەڵە ئەستێرەن دیارن، نزیك رێگەی کاکێشان، کەشتەیوان ( ماجەلان) ل بە دەوری زەویدا دۆزینییەوە. |
| سحابة المطر، سحابة ممطرة | Rain cloud | هەوری بە باران . |
| سحاب قمعي | Funnel cloud | هەورە رەحمەتی ، جۆرە هەورێکە شێوەکەی لە رەحمەتی زۆر نزیك دەبێت لە رووی زەوییەوە، هەندێك جار بە ر‌ |
| سحابة الكترونية | Electron cloud | هەوریس ئەلەکترۆنی یان دەستکرد، کۆمەڵێك ئەلیکترۆ: هێواش بوویێتەوە و بە شێوەی هەور پەنگیان خواردبێ |
| سحاب رقيق، سحاب رُهج | Cirro nebula | هەوری تەماوی. |
| سحاب مرتفع، طخارير، طخاف | Cirrus | هەورە بەرزە، پەڵە هەورێکی تەنکی بەرز کە لە خوریی |
| سحاب طبقي | Altostratus | هەوری چینی، هەوری چینچین، نزیکەی (١٢) هەزار ؛ |
| سحاب الصيف، قلع | Cumulus | هەوری هاوین . |
| سحاب ركامي | Altocumulus | هەوری کەڵەکەیی، جۆرە هەورێکە بەرزییەکەی مام ناو |
| سحاء بيضاء ، يحلولة | Cotton ball cloud | هەوری سپی. |
| سحار، ساحر | Sorcerer, Magician, Wizard | جادووگەر. |
| سحاري ، سيفونوفور | Siphonophore | سیفونۆفۆر، گیاندارێکی دەریایی ساکارە، جۆرێکە لە |
| سحاحة | Burette, Buret | (لێزمێنەر)، بورێتە، بۆرییەکی لوولەیی شووشەی پا باریکە، پلسکێکی پێوەیە بۆ پێوانی قەوارە و پەیتییش |
| سحاق ، الطاف، لسبية، سافية | Lesbiamism, Tribadism, Sapphism | پانپانۆکی، ئارەزووی مێ بۆ مێ ، پەیوەندییەکی رەگ نێوان ژناندا . |
| سحار | Mountain spiguel | گیایەکی لەوەرە، قەدەکەیس شیراوی تێدایە . |
| سحابة العين، غشاوة العين، غفاءة، ودق | Leukoma, Film on the eye, Nebula( eye) | ( لیکۆما)، لێڵانی چاو، لەکەی چاو، تانەی چاو، تا چاودا ، پەڵەیەکی سپی لەسەر چاو. |
| سحابة علي القرنية، ضباب النظر | Caligo | تەمی چاو ، تەمێك لەسەر زەرەبینی چاو یان تەنی شو |
| سحارة | Culvert | زێراب ، زێرابی ئاوی پیسی . |
| سحاقية، امراءة مساحقة | Lesbian | پانپانۆکەر، ژنێك کە ئارەزووی ژنێکی تر بکات لە رو |
| سحارة، سيفون | Siphon | ( سیفۆن) ، ئامرازی هەڵمژین بۆ گواستنەوەی ش قاپێکی‌تر. |
| سُحار حرارية | Thermosiphon | سیفۆنی گەرمی. |
| سحارة | Lung | سی، بەشێکە لە کۆئەندامی هەناسەدان. |
| سحارة ، معلاق | Pluck | سیوجگەر. |

| | | |
|---|---|---|
| سحاف، سل | Phthisis | سیل، نەخۆشیی سیل. |
| سحاف الزيتون | Bacterium savastonol | سیلی زەیتوون، نەخۆشی‌یەکی باکتریای‌یە، دەدات لە رووەکی زەیتوون. |
| سحالة | Shell | توێکڵ، وەکو توێکڵی دەنکە گەنم و جۆ. |
| سحالة ، برادة الذهب | Gold-filings | وردە ئاڵتون، خاکەی زێڕ. |
| سحالي | Varanida | کۆمەڵەی مارمێلکە، وەکوو مارمێلکە و شەوگەرد و قۆڕی. |
| سحام، مرق ، صدأ | Puccinia | ژەنگ، جۆرە کەڕوویەکی زیانبەخشە نەخۆشیی رووەکی بڵاو دەکاتەوە. |
| سحام، سبريرة | Indian mango tree | مانگۆی (عەمبە) هیندی، درەختێکە لە کۆمەڵەی ژاڵە، گوڵی سپی یان پەمەیی دەگرێت، مادەی ژەهری لێ دەردەهێنرێت. |
| سحاة | Synotus | (سنۆتەس)، جۆرێکە لە شەمشەمەکوێرە. |
| سحب | Drawing, Pulling | راکێشان. |
| سحب الماء ( من المواد الكيمياوية) | Dehydration | ئاوگرتن، ئاو دەرهێنان (لە مادە کیمیای‌یەکان). |
| سحبة واحدة | Atastertch | یەك جار راکێشان وەکوو لە یانسیبدا. |
| سحبية، قابلية الطرق و السحب، طروقية | Ductility | پیاڕاکێشان، بەرگەگرتنی پیاکێشان و ڕاکێشان بۆ دروستکردنی دەزوو یان تەلی باریك بەبێ پچڕان، وەکوو لە هەندێك کانزاکاندا، بەتایبەتی زێڕ و زیو و مس. |
| سحت، ضور، شره مرضي | Bulimia | نەخۆشیی تێر نەخواردن، تێر نەخۆری. |
| سحج | Abrasion | داڕووتانەوە، کڕاندن، وردبوون یان بچووکبوونەوەی بەرد، بەهۆی باو بۆرانەوە. |
| سحج، تسلخ | Paratrimma | رووشانی پێست، داماڵانی پێست. |
| سحج | Traumatism | سووتانەوەی پەناڕان، شوێنی دوومەڵ و برین، قەتماغەی برین. |
| سحج، قشر | Abrading, Scarping, Rubbing off | توێکڵ کردن، پاك کردن. |
| سحج | Planing | سافکردنی رووی تەختە بە رنە (رەندە). |
| سَحَر، فجر | Early morning, Day break, Dawn | بەرەبەیان، شەبەق. |
| سِحر، شعوذة | Magic, Witchery, Sorcery | سیحری، ئەفسوون، جادوو، دەم بەست، نێرەنگ، جازوو. |
| سِحري | Magic | ئەفسووناوی، ئەفسوونانە، جادوویی. |
| سَحفَة، سنام | Hump | بەزی سەرپشت، دووگی سەرپشت، وەکو لە وشتردا. |
| سَحْق | Crushing, Allontois, Trituration | هاڕین، وردکردن، پەڵخورد، پلیشاندنەوە، وردوخاش کردن. |
| سحق حراري، تكسير حراري | Thermal cracking, Thermal crashing | هاڕین بە گەرمی، کرداری شیکردنەوەی نەوتی‌سروشتی بە کاری گەرمی، بە بوونی یان نەبوونی کارکەری یاریدەدەر، بۆ پەیداکردنی گازۆلین و بەنزین. |
| سُحق، بُعد | Remoteness | دووری. |
| سحُل، عروسة الماء | Butterfly fish | بووکی ئاو، ماسی‌یە پەپوولە، پەپوولە ماسی، جۆرە ماسی‌یەکی رەنگینی زۆر جوانە. |
| سحلية عديمة الأرجل | Amphisbaena | (ئەمفیسبانیا)، مارمێلکەی بێ قاچ. |
| سحلية الشكل | Lacertiform | مارمێلکە شێوە، شێوە مارمێلکەیی. |
| سحلية، سقاية، عظاءة | Lizard, Gecko Lacerta | مارمێلکە، سوسەمار، بلقەدەر، شەوگەرد، مارمیلۆك، پیسپیسۆك، جۆرە مارمێلکەیەکی زەردە لە ناو ماڵدا دەژی. |

| | | |
|---|---|---|
| سحلية مدرعة | Armadillo lizard | مارمێلکەی قەڵغاندار. |
| سحلية ذات لحية | Bearded lizard | مارمێلکەی ریشدار. |
| سحلية مطوقة | Collared lizard | مارمێلکەی تەوقدار، وەکو تەوقی لە ملدا هەبێت وایە. |
| سحلية خضراء، حكاءة | Green lizard, Maubia, Emeral lizard | مارمێلکەی سەوز، جۆرە مارمێلکەیەکی جوانە رەنگێکی سەوزی هەیە ماڵی دەکرێت. |
| سحلية السياج | Fence lizard | مارمێلکەی پەرژین، مارمێلکەی تەویلە. |
| سحلية زجاجية | Glass lizard | مارمێلکەی شووشەیی، جۆرە مارمێلکەیەکە پەلی نیە. |
| سحلية مقرنة، سحلية قرناء | Horned lizard, Phrynosoma | مارمێلکەی شاخدار. |
| سحلية عينية | Eyed lizard | مارمێلکەی چاودار، جۆرێکە لە مارمێلکە چاوی گەورەیە. |
| سحلية صنارية الأنف | Hook nosed lizard | مارمێلکەی لووت قلاپی. |
| سحلية الصخر | Rock lizard | مارمێلکەی بەردەڵانی. |
| سحلية الرمل | Sand lizard | مارمێلکەی لمانی. |
| سحلية مبقعة، سحلية مرقطة | Spotted lizard | مارمێلکەی پنکە پنکە، مارمێلکەی کونج. |
| سحلية سوطية الذنب | Whip-tail lizard | مارمێلکەی کلك قامچی. |
| سحلية هدابية الذنب | Fringe-tailed lizard | مارمێلکەی کلك ریشوودار. |
| سحلية حزامية الذنب | Gridle-tailed lizard | مارمێلکەی کلك پشتێنی. |
| سحلية الشجرة | Tree lizard | مارمێلکەی درەخت. |
| سحلية الجدار | Wall lizard | مارمێلکەی دیوار (شەوگەرد). |
| سحلية الماء | Water lizard, Hydrosaurus | مارمێلکەی ئاویی، جۆرێکی گەورەیە لە مارمێلکە. |
| سحلية دودية | Worm lizard | مارمێلکەی کرمیی، جۆرە گیاندارێکی تەرووشکییە. |
| سحلية شريرة، سحلية الطيف، سمندل الكهف | Ghost lizard, Grotto-salamander | قورناویلکەی کرمیی، جۆرە گیاندارێکی تەرووشکییە. |
| سحلية سامة، هيلوديرما | Heloderma | (هیلۆدێرما)، مارمێلکەی ژەهرین. |
| سحلية كومودو | Comdo lizard | مارمێلکەی کۆمۆدۆ، تیمساحی زەویی، مارمێلکەیەکی درندەیە نزیکەی ٣-٤ مەتر درێژ دەبێت. |
| سحلية، سقاية، عظاية | Lizard | مارمێلکەی فرەکلك، جۆرە مارمێلکەیەکە رەنگەکەی سەوزی مەیلەو زەردە کلکێکی درێژی هەی نزیکەی (٢٤) سم دەبێت، درێژیی هەموو لەشی جاری وا هەیە دەگاتە (٤٠)سم، زۆرجار رێك دەکەوێت کە دووکلك یان سێ کلکی هەیە لە کەلاوە و ئەشکەوتی چۆڵدا دەژی. |
| سحلية شائكة، سحلية مقدسة | Spiny lizard, Mesquite lizard, Prairie lizard | مارمێلکەی درکاوی، جۆرە مارمێلکەیەکە شێوەیەکی سەیری هەیە، زەردێکی مەیلەو بۆرە، پەڵە پەڵەی رەشی پێوەیە، لەشی گرێ گرێ و درکاوییە وەك ئسفەنج ئاو هەڵدەمژێت، لە ئوسترالیا دەژی، مێروولەیەکی زۆر دەخوات، بێ زیانە بۆ مرۆڤ. |
| سحلية مخيفة، سحلية هيلية | Gilamonster | مارمێلکەی ترسناك، مارمێلکەیەکی ئەمریکیی کەتەیە (درندەی جیلا). |
| سحلية الأغوانة | Iguana | (ئیگوانا)، مارمێلکەیەکی کەتەی گیا خۆرە لە ناوچە گەرمەکانی ئەمریکادا دەژی. |
| سحلية اغاما، عضرفوط، أم حبين | Agama | قۆزی، جۆرێکە لە مارمێلکە. |

| | | |
|---|---|---|
| سحلية رملية | Sand lizard | مارمێلكەی لم. |
| سحلية طائرة | Flying Dragon | مارمێلكەی فڕندە، جۆرە مارمێلكەیەكە كە بە هۆی پەردەكەی لە شی‌یەوە لە درەختێكەوە دەچێت بۆ درەختێكی تر. |
| سحلية ولود | Viviparous lizard | مارمێلكەی بزۆك، جۆرە مارمێلكەیەكی دڕندەیە بێچووی دەبێت. |
| سحلية ذات التاج | Combed lizard | مارمێلكەی پۆپنەدار. |
| سحلية ذات ثنيات جلدية، سحلية مشعرة | Frilled lizard | مارمێلكەی یەخەدار، مارمێلكەی باڵدار، جۆرە مارمێلكەیەكە كە تووڕە دەبێت پێستی دەورووپشتی ملی ( كە وەك یەخە وایە) گیڤ دەكات و هەڵ دەستێتە سەر هەردوو قاچ و دەمی دەكاتەوە و فیشكەیەك دەكات، دوژمنی پێ دەترسێنێت. |
| سحلَب، خصي الثعلب، قاتل اخيه، سطوريون | Salep plant, Salep rubers, Lizard orchis, Orchis, Orchid | سەعلەم، گونە ڕێوی، سالمە، ڕووەكێكە لە ناوچە ساردەكاندا دەڕوێت گوڵەكەی جوانە، سەلكەكەی وشك دەكرێتەوە و مادەیەكی نیشاستەی لێ دەردەهێنرێت پێی دەگوترێت (سالیپ) بۆ دروستكردنی خواردەمەنیی شیرینی، هەروەها هەندێكیان مادەیەكیان لێ دەردەهێنرێت وەكو چای دەخورێتەوە، یان بۆ مەبەستی پزیشكی بۆ بەهێزكردنی دەمار بەكار دەهێنرێت. |
| سَحلة، سُحلة | Young Rabbit | بەچكە كەروێشك. |
| سحم، سحمة، سواد | Blackness | ڕەش، ڕەشایی، ڕەشێتی. |
| سحنة، سيماء | Physiognomy, Mien, Aspect, Facies | ڕوو، دیمەن، شێوە، چارە، چرۆچاو، ڕووخسار، دەموچاو. |
| سحنون | Meelierax | (میلیراكس)، جۆرێكە لە هەڵۆ. |
| سَحن | To powder, Pulverise | وردكردن، هەویر كردن، كردن بە تۆز. |
| سحور | Day break meal | پارشێو، پارشیو، پاشیڤ، پاش شیو. |
| سحوق | Tall date palm tree | دار خورمای زۆر بەرز. |
| سحيقة، زيت الفجل | Radish oil | ڕۆنی توور، ڕۆنێكی پزیشكی‌یە لە تۆوی توور دەر دەهێنرێت دژی نەخۆشیی دەماریی و بەردی زراو بەكاردێت. |
| سخاب، قلادة قرنفل | Necklace of cloves | مێخەك پەند، ملوانكەیەك لە مێخەك دروست كرابێت. |
| سخاخ | Thorough soil | زەوی‌یەكی نەرمانی. |
| سُخام، هباب سناج | Soot, Crock, Smut | هێس، تەنی، ڕەشیی مەنجەڵ، دوورینج، دوورژینگ. |
| سُخام، مرض السخام | Smut | خەڵوورزە، نەخۆشی‌یەكی ڕووەكی‌یە. |
| سَخان، سخانة | Geyser | گیزەر، دەزگای گەرم كردنی ئاو. |
| سُخت، بنزهير، بادزهر، ترياق ضد السّم | Bezoar | بادزەهر، ئەو شتەی كە لەناو سكی بێچووی ئاژەڵ دێتە دەرەوە پێش ئەوەی خواردن بخوات گوایا بۆ لابردنی كاری ژەهر بەكار دەهێنرێت. |
| سختيان | Morocco Leather | چەرم، پێستەی دەباخكراو. |
| سُخد، مشيمة | Placenta, Maza | وێڵداشی منداڵدان، ئەو پارچە گۆشتەی كە دوای منداڵ بوون لە لەشی دایكەوە دێتە دەرەوە. |
| سخد، جَزْل | Bifidity, Bifid fruit | شەنگۆڵ، شەنگەڵە، شمڵی بەرەكەت، پێكەوەنووسانی دوو ئەندامی ڕووەكی وەكوو دوو گەڵا یان دوو بەر یان دوو تۆو وەكوو لە گوێز یان هەڵوژە یان مازوودا. |
| سخرة | Unpaid-work | بێگاری، بێگار. |

| | | |
|---|---|---|
| سخرية، هُزء | Laughing-stock, Butt, Sarcasm | قەشمەری کردن، تیز، گاڵتە پێکردن، قەوز، تز. |
| سُخط | Excrement of birds | ریقنە، جیقنە. |
| سُخط | Anger | رق، قین. |
| سخطة، مسخوط | Runt, Dwarf | عاجباتی، منداڵێکی ساوا کە شێوەی لەشی سەیر و ناڕێك بێت. |
| سخطتان متحدتان | Hemi pagus | دوو منداڵی عاجباتی کە لە سنگ و سکەوە پێکەوە نووسابن و یەك دەمیان هەبێت. |
| سخف، سلف | Scarify | شیکردنەوەی زەوی بە پاچەکۆڵە. |
| سخل، سخلة، طلي، حَمَل | Lamb | بەرخ، کار. |
| سخم، سخمة، سواد | Blackness | بڕوانە (سحم). |
| سخن، ساخن، حار، حام | Worm, Hot | گەرم. |
| سَدّ (سَدّ مائي) | Weir, Tight, Dam, Barrage | بەستەن، بەربەست، بەربەند، بەند، بەنداو، شووره، بەست، بەربان، بەربەن. |
| سدّ انضاب | Coffer-dam | بەندێکی کاتییە (وقتی) بۆ گۆڕینی ڕێڕەوی ئاو. |
| سدّ | Closing, To stop | داپۆشین، سەرنانەوە، داخستن. |
| سدا، خلة كبيرة | Ammi, Bishopsweed | نانخواز، نانخوا، زیرەی حەبەشی، گیایەکی پزیشکییە لە ڕەشکە و شمڵی دەچێت، دەنکەکەی دەکرێتە نانەوە بۆ ئەوەی تام و بۆنی خۆش بکات. |
| سداب، سدب | Rue, Herb of grace | پێنچین، ئەسپەند، سپەند، ئەسفەند، جۆرێکە لە ڕووەك. |
| سدى | In vain | فیڕۆ، خۆرایی. |
| سداد، سدادة | Stopper, Stopple, Plug, Tampon, Pigot | سەرقاپ، قەپاغ، پشك، تۆپەوانە، دەمەوانە، دەفۆك. |
| سداد الانف، زائدة انفية | Adenoids | زیادە گۆشتی ناو لووت. |
| سدادة الحوض، طبة | Plug | دەمەوانەی حەوز. |
| سداد النظر | Emmetropia | بینینی چاو بە باشی. |
| سداد ، صمة، مسمار دموي | Embolus | بزماری خوێنین، داخەری خوێنبەر، پشکی خوێن، کەمێك دەمەیێت و لە بۆرییەکی خوێندا دەگیرسێتەوە و بەری خوێنەکە دەگرێت. |
| سداد مطاطي | Rubber-stopper, Rubber cork | سەرقاپی لاستیکیی، دەمەوانەی لاستیك. |
| سداد مطاطي ذو ثقبين | Rubber stopper ( two holes ) | دەمەوانەی لاستیکی دوو کون. |
| سداد فليني | Cork stopper | دەمەوانەی تەپەدۆریی. |
| سداد لولبي | Screw stopper | دەمەوانەی برغوویی، سەرقاپی برغوویی. |
| سداسي المثيلين، ثنائي الامين | Hexamethy-lene diamine | هێکسامەثیلین دای ئەماین، شەشەم مەثیلینی دووەم ئەماین، مادەیەکە بە شێوەی تەلاشی وردی سپی هەیە لە دروستکردنی نایلۆندا بەکاردێت. |
| سداة | Stamen | ئەندامی نێرەکی، ئەندامی نێرینە لە گوڵدا. |
| سداة النسيج | Warp | تان، دەزووی چنین کە بە باری ئەستوونی ( قیت) ڕایەڵ دەکرێت. |
| سداسي | Hexa, sixth | شەشە، شەشەم. |
| سداسي الازهار | Hexa Flower | شەش گوڵ. |
| سداسي التكافؤ | Hexavalent | شەش هاوێزی، شەش ڤالەنسی. |
| سداسي الارجل | Hexapod | شەش پێ، وەکو مێش و مەگەز. |

| | | |
|---|---|---|
| سداسي الاصابع، اعنش | Sixdigitate, Hexa dacty lia | شەشۆ، شەش پەنجە، کەسێك شەش پەنجەی هەبێت . |
| سداسي الاضلاع، سدايي الزاويا | Hexagon | شەش لا، شەشە گۆشە. |
| سداسي السطوح | Hexahedron | شەش ڕوو. |
| سدة | Blind alley, Blind lane | کۆلانێك کە دەرنەچێت، کوێرەڕێ. |
| سدة، باب | Gate, Door | دەرگا. |
| سُدة، منبر، عرش | Pulpit, Throne | پایە، مەقام، مەقان. |
| سدد البصر | Glare | چاوئاوکردن، لە ئەنجامی تیشکی بەهێزەوە. |
| سدر النظر، زغللة، ضعف البصر | Dazzlement, Confusion, Scieropia | چاوکزی. |
| سدر، تحير | To be dazede | سەرسوڕمان. |
| سدر، دوخة، دوار | Vertigo, Dizziness | گێژبوون، سەرگێژخواردن. |
| سِيدر | Cider | ( سیدر) شەرابی سێو. |
| سدر، نبق، نبق المسيح، شوكة المسيح | Nabk tree, Africanlotus, Nabeca | تاوك، مورتك، تەعمو، کەیر، درەختێکە بەرەکەی لە عەنەب دەچێت زەردە و کەمێك شیرینە، جۆرە دەرمانێکی لێدەردەهێنرێت بۆ نەرم کردنی قژ. |
| سيدار | Cedar | درەختی ئەرز، جۆرێکە لە درەختی کا (سنەوبەر). |
| سدر بري، ضال | Lotus jujube, Zizyphus-lotus | تاوگە کێویلە، عەنەبە کێویلە . |
| سدرلا، سدرال، تونة، شربين الاكاجو | Cedrela, Acajou-cedar, False cedar | هەڤریسکی ئەکاجۆ، ئەرزی ئەکاجۆ، داری دیو، درەختێکی بەرزە لە درەختی زمانەمەل دەچێت، تەختەکەی جوان و بەنرخە بۆ دروستکردین سندوقی بەنرخ بەکاردەهێنرێت، تەختەکەی لە تەختەی کینار و تاوگ دەچێت، گوڵەکەی سپی و شۆڕ و بۆن خۆشە. |
| سدرية ، سل الحدادين | Siderosis | سیلی ئاسنگەرەکان، پیس بوونی سیی ئاسنگەرەکان بە تۆزی ئاسن . |
| سُدس | Sixth part | شەش یەك، ١/٦. |
| سِدسية، الة السُدس | Sextant | ( سیکستانت)، ئامرازێکە بۆ پێوانی بەرزی تەنە ئاسمانییەکان لە پاپۆر یان فڕۆکەوە . |
| سُدسية | Sextans | شەشانە، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشوورییە. |
| سَدَف، نور الخسق و الفجر | Twilight, Dusk | ڕووناکی بەرەبەیان ، ڕووناکی شەبەق. |
| سُدفة | Cardia | کونی سەرەوەی گەدە کە نووساوە بە سورێنچکەوە . |
| سدفة، سرة نقير | Hilum | شوێنی نووسانی تۆو بە توێکڵی بەرەوە لە ڕووەکدا. |
| سدل | Curtain | پەردە. |
| سدل | Velum | مەمیلە، کۆڵك، ڕیشوو. |
| سَدَل | Chordee | ئازار و چەوتبوونی چووك ( کێر) لە کاتی هەستاندا. |
| سدلة، شريحة | Flap | توێ، کووز، قاش. |
| سدم، فحل | Stallion, Bull | نێری گیاندار، بە تایبەتی ئاژەڵ کە بۆ پەڕاندن تەرخان کرابێت. |
| سدنوس | Cydnus | ( سایدنەس)، مێروویەکە ئاوی ڕووەك دەمژێت . |
| سديم، ضباب | Mist, Haze | تەم، مژ، تەمومژ. |

| | | |
|---|---|---|
| سديم | Stratus | تەم، هەورێکی ڕوونی تەنك. |
| سديم ( في الفلك) | Nebula | تەمە ئەستێرە:<br>١. پەڵەیەکە لە ئاسماندا ڕووناکی‌یەکی کزی هەیە هەندێکی بریتی‌یە لە چەند گازێکی ڕووناککەرەوە هەندێکیشی بریتی‌یە لە چەند ئەستێرەیەکی بچووکی گەرۆك لە ڕێگەی کاکێشاندا دەبینرێت .<br>٢. تەنێکی گازی گڕگرتووی زۆر گەورەیە . |
| سديم خارج المجرة | Extra-lacticnebula | تەمومژی دەرەوەی کاکێشان . |
| سديم السرطان | Crab nebula | تەمە ئەستێرەی قرژاڵ. |
| سديم متوهج | Luminous nebula | تەمە ئەستێرەی گڕگرتوو. |
| سديم لامع | Bright nebula | تەمە ئەستێرەی بریسکەدار . |
| سديم معتم | Dark nebula | تەمە ئەستێرەی لێڵ یان تەلْخ. |
| سدى، ندى | Night dew | شەونم، ئاوڕنگ. |
| سدى، لحمة | Stroma | شانەی کۆکەرەوە کە مادەی خانە یان ئەندام پێك دەهێنێ . |
| سديرة | Areola | گرێیەکی تووکاوی یان درکاوی‌یە بە قەدی هەندێك ڕووەکەوە ، وەکو لە هەنجیری درکاوی‌دا . |
| سذاب، سداب، ختف، سذب، فيجن، خفت | Rue, herb of grace | پێچن، ئەسپەند، سپەند، ئەسفەند، گیایەکی پزیشکی تەمەن درێژی هەمیشە سەوزی بۆن خۆشە، گەڵاکەی خۆڵەمێشی و تاڵە گوڵەکانی بە شێوەی هێشوویەکی زەردن، سودێکی پزیشکی هەیە و مادەی ئایۆدینی لێ‌دەردەهێنرێت. |
| سذاب بري، حرمل | Wild Rue | پێچینە کێوێل، ئەسپەندە کیویلە . |
| سذاجة، بساطة | Simplicity, Plainness, Silliness | ساکاریی، سادەیی. |
| سذاب المروج | | بڕوانە ( زهرە سذاب المروج) |
| سر | Secret | نهێنی، ڕاز. |
| سر الليل ، كلمة السر | Password | پەرلە، نهێنی شەو، ووتەی نهێنی . |
| سرء، سراة، سروة، بطارخ | Caviar, Spawn, Roe of the fish | گەرای ماس ، کافیار . |
| سراب، خيدع | Mirage | سەراب، ئاونما، بەردە تراویلکە، پەپەرك، ڕەوڕەوك، ڕەوڕەو، ورشە، ڕووداوێکە لە قرچەی گەرمادا لە بیابانەکاندا دەبینرێت وەکو ئاوێك وێنەی خانوو و دار و درەختی تێدا دەردەکەوێت، هەر دەڕۆیست و نایگەیتێ. |
| سرّاء، سرّاءة، سراية، نبع | Zilla-mayagrodies, Grewia excelsa | درەختێکە لقەکەی زەردە ئەگەر بمێنێتەوە سوور دەبێت ، بەرکەی وەك قەزوانی شین وایە . |
| سرا | Horse-sickness | دەرخونە، نەخۆشی‌یەکە لەناو وولاخدا بلاْودەبێتەوە. |
| سرابية، كومرونة | Coumarone, Tonka, Tonk bean tree | تۆنکا، درەختێکە مادەی ( کۆمارۆنا)ی بۆن خۆش لە تووەکەی دەردەهێنرێت ، بەرەکەی لە شەمامە دەچێت . |
| سراج | Night lamp, night light | چرا، شەماڵە، لەمپا، چراخ، چاووگە، چاووك، چراووگ، دەستەچیلە، چۆڵەچرا. |
| سراج الليل، يراعة، حباحب | Fire fly, Glow-warm | گوڵە ئەستێرە، جۆرە مێروویەکی فڕندەیە بە شەو ڕووناکی دەداتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| سراجة، سقاوة، ذناب الخيل، جفيل الخيل، ذيبة، علة المنقافا | Glanders, Epiuzootic-Lymphanyitics, Equina | مەقاو، سەقاو، نەخۆشییەکی درمە تووشی وولاَخ دەبێت، گریَ و برین لە بۆری لیمفیدا پەیدا دەبێت . |
| سَراج، سروجي | Saddler | زیندروو، سەراج. |
| سراج الخولة، سورنجان، لحلاح | Meadow-saffron, Colchicum | سورنجان، سوورەجان، گیایەکی پیازی پزیشکییە. |
| سراج ، خُرم، سراج القطرب | Agro stemma | مرۆر، گیایەکە لە کۆمەڵەی میخەك تۆوەکەی تاڵ و ژەهرینە زیان بە کشتوکاڵ دەبەخشێت . |
| سراجية، قصب ذهبي، خوخ الماء | Loosestrife , Lysmachia | قۆخی ئاوی، گیایەکە گوڵی زەرد دەگرێت . |
| سراجة ، صناعة السروج | Saddlery | زیندروون، سەراجی . |
| سراجة، شراجة، خياطة متباعدة | Basting | کۆك گرتن، شەلاَڵ کردن لە دروومان‌دا . |
| سراحية | Picher Ewer | سوراحی ، دەفرێکی شووشەیی مل باریکە شلەی تیَ‌دەکرێت . |
| سراسينيا | Sarracenia | ( ساراسینیا ) ، رووەکێکە لە زەلکاودا دەژی گەڵاکەی وەك توورەکە وایە مادەیەکی شیرین دەردەدات مێش و مەگەز رادەکێشت و دەیانخوات و هەرسیان دەکات . |
| سرادق | Canopy, Pavilion | چیغ، خێوەت، چادر، رەشماڵ.. |
| سرازان، حنطة سوداء | Sarrasin, Black wheat | ( ساراسین)، گیایەکە بۆ لەوەر باشە، گەنمی رەش. |
| سراش | Glue | سرێش، هێلم، ئەسلێرك. |
| سراط، سبيل | Road, Way | رێگە. |
| سراعيب ( سرعوب)، عرسيات | Mustelida | کۆمەڵە گیاندارێکی شیردەری بچووکی گۆشت خۆرن پێستەکەیان بە نرخە وەکو دەڵەك و مشکی خورما. |
| سراغة، سرغة، حوذان | Crepis | جۆرە گوڵێکە. |
| سراق، لص | Pick-pocket, thief | دز، گیرفانبڕ. |
| سراق، منشار | Saw | مشار، ئامرازێکە بۆ برینەوەی دارو تەختە بەکاردێت . |
| سراي، صرح | Palace, Seral | سەرا. |
| سراية، عدوى سرئية | Infectin, Contagion | داکەوتنی نەخۆشی، بلاَوبوونەوەی نەخۆشی، تەنینەوەی نەخۆشی . |
| سرى | Night walking | شەورەوی، شەو رۆیشتن . |
| سَرَب | Store, Depot | گەنجینە یان عەماری خواردەمەنی . |
| سرب، نفق | Tunnel | تونێل، توون، رێگەیەك بە ژێر چیادا . |
| سرب، مصرف | Sewerage, drain | زێراب، زێرابی ئاوی پیس یان ئاوی زیادە. |
| سِرب | Swarm, Herd, Drove, Flock, Troop | پۆل، پۆلی باڵندە و گیاندار . |
| سرب، حفار | Gilthead | ماسییەکی جوانە . |
| سِرب النحل | Swarm | پوورەی هەنگ، پۆلی هەنگ. |
| سرب الطائرات | Flight | ١. پۆلە فڕۆکە.<br>٢. پۆلە باڵندە. |
| سرب السمك | Fish scool | پۆلە ماسی. |
| سرب، تسرب | Leakage | گوزەرکردن، دادان. |

| | | |
|---|---|---|
| سربال، ملبس | Garment-dress | جلوبەرگ، پۆشاك. |
| سريرة، كلب جهنم سربيرة | Cerbera | ( سەربەر)، سەگ خنكێن، سەگی دۆزەخ، درەختێكی ژەهرینە لە كۆمەڵەی ژاڵە ، گوڵەكەی سپی‌یە ، بەرەكەی هێلكەیی‌یە. |
| سربنتين، حجر الحية | Serpentine | (سەرپەنتین)، بەردێكی كانزایی بەنرخە ، رەنگەكەی سەوز و پنكەپنكەیە لە رەنگی پێستی مار دەچێت ، مەگنسیۆم و سلیكۆن و ئۆكسجین وهایدرۆجینی تیادایە . |
| سربرين | Cerberin | ( سەربەرین)، مادەیەكی ژەهرە لە بەری سنەوبەر دەردەهێنرێت . |
| سرّة | Navel, Umbilicus, Umbo, Omphalus | ناوك، نافك، ئەو چاڵەی كە لە پێستی سكی گیانداری شیرداردا هەیە، شوێنی نووسانی پەتی ناوك بە سكی كۆرپەلەوە بەر لە دایكبوونی . |
| سرّة ( في البذرة) | Hilum, Hilu | ئەو چاڵەی كە لە تۆوی رووەكدا هەیە، شوێنی جیابوونەوەی تۆو لە توێكڵی بەرز |
| سرّة ( صرّة) | Sealed bag of money | پریاسكە، پرێسكە، بوخچە، جزدان. |
| سرُة، اشران، سرة الارض ، قدح مريم | Cotyledon, Navel wort | ناوكی زەوی، گیایەكە گوڵی شۆڕی جوان دەگرێت . |
| سرج، برذعة الخيل | Saddle, Sella | زین، قەلتاغ، قەلتاخ، شتێكە لە تەختە و چەرم دروست دەكرێت لە تفاقی زینە، ئادەمیزاد لە كاتی سواریدا لەسەری دادەنیشێت . |
| سرج ( في دودة الارض) | Clitellum, Sella | كۆپانۆكە، زینۆكە، ناوچەیەكی بەرزی لووداره بەسەر لەشی كرمی زەوییەوە. |
| سرج تركي، حفرة نخامية | Turkish-saddle, Sellaturcica | زینی توركی، ئەو چاڵەیە كە لووی ( گلاندی) پیتویتەری تیادایە لە كەللەی سەردا. |
| سرج مزركش | Decorated-saddle | زینی ڕازاوە، شەقبەند. |
| سرجون | Surgeon fish | ( سەرجێون)، ماسی‌یەكی ناوچە گەرمەكانە. |
| سرجي | Silliform | زینی ، كۆپانی. |
| سرجين، سرقين | Dung, Manure, Guano, Stable-litter | سەرگین، تەپاڵە، پشقل، قشپل. |
| سرح، عسل البياض، طريح | Eel-wood, Cadaba | داری جۆریی، داری نقە، جۆرە درەختێكی بەرز و پانە سێبەری زۆرە بەرەكەی زەردە لە زەیتون دەچێت و دەخورێت. |
| سرح البول، سلس البول | Uorhea | دەڵەمیزی، میزڕەوانی، میزنی. |
| سرحاب | Bat | شەمشەمەكوێرە ، گیاندارێكی شیردەرە بە شەو دەفرێت . |
| سرحان، ذئب | Wolf | گورگ، گیاندارێكی شیردەری دڕندەیە لە كۆمەڵەی سەگ. |
| سرحة | River-mangrove | ( مانگرۆڤی ڕووبار) ، دەوەنێكە گەڵا و بەرەكەی بۆ دەباخچێتی باشە. |
| سرحوب | Jackal | چەقەڵ، توێری، توورگ، گیاندارێكی شیردەری دڕندەیە لە كۆمەڵەی سەگ. |
| سرحوب، سرعوب | Weasel | مشكی خورما گیاندارێكی شیردەری گۆشت خۆرە، مشك و باڵندە دەخوات. |
| سرخس، خشار | Fern | گوڵداروی كەرەوزە كێویلە، بارێزە، قەیتەران، خاڵەرەش، بەرمزا، قژی كچ، قژی كەنیشك، پەلی سیاوەشان، قژی جنۆكە،ریشی پیرەمەرانە، پەلی سیاوەشان، جۆرێكە لە گیای ئاوی لقەكەی رەشە گەڵاكەی لە گەڵای كەرەوز دەچێت گوڵ ناگرێت . |
| سرخس، مزهر، اسمندة | Osmunda | كەرەوزە كێویلەی گوڵدار. |
| سرخس اللوط ، حشيشة الطحال | Spleen wort | گیا سپڵ، جۆرێكە لە كەرەوزە كێویلە ، گەڵاكەی لە گەڵای ترشۆكە دەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| سرخاب، نحام، بشروش | Flamingo | سوورەقاز، سوورە قولنگ ، باڵندەیەکی ئاوییە، مل و لاقی درێژە و دەنووکی زلە، ماسی بچووك دەخوات. |
| سردين، صحناة | Sardine | ( ساردین)، ماسی‌یەکی گۆشتخۆری بچووکە لە قەراغ دەریاکانی ناوچە گەرم و فێنکەکان دا دەژی (١٥) رەگەزی هەیە کە دابەش بوون بۆ (٥٦) جۆر، جۆرە ماسی‌یەکی بچووکە دەکرێتە قووتوەوە بۆ خواردن ئەشێ یان خوێ یان رۆن زەیتوونی پێوە دەکرێت . |
| سردونقس، عقيق مشطب، عقيق مجزع | Saredonyx | ( ساردۆنیکس)، یاقیقی هێڵدار، هێڵی سپی و زەرد و سووری تیایە . |
| سردونيا | Sardonia | ( سارۆدنیا)، گیایەکی گەڵاپانە گوڵێکی سوور دەگرێت . |
| سرداب ارضي | Cellar, Crypt, Basement | سارداو، ژێرخان ،ژێر زەمین. |
| سرر، حبل سري | Umbilical-cord | پەتی ناوك. |
| سرساب، سرسام | Hypochondria | وەسواسی،ترسان لە تووش بوونی نەخۆشی . |
| سرساد | Chastrtree, Hemp tree, Vitex | درەختی پێنج ئەنگوست، درەختی پێنج ئەموست، درەختی داوێن پاکی، درەختی گوش، دەوەنێکە گوڵی شینی بۆن خۆش دەگرێت . |
| سرسين | Sarcin | ( سارسین)، مادەیەکی کیمیایی‌یە |
| سرسينة | Sarcina | ( سارسینا)، جۆرێکە لە بەکتریا. |
| سرسام، التهاب السحايا | Meningitis | ئاوسانی پەردەکانی مێشك. |
| سرسنيت | Sarcenet | ( سارسنیت)، قوماشێکی ئاوریشمی تەنکە. |
| سرسين | Sericin | ( سیریسین)، ئاوێتەیەکی ئەندامی لینجە لە ئاوریشم دەردەهێنرێت . |
| سرطان، برج السرطان | Cancer, The crab | بورجی قرژاڵ، کەلووی قرژاڵ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی نەرۆکە ( نەگەرۆك) . |
| سرطان | Cancer, Carcinoma | شێرپەنجە، کەوگیرە، دومەڵێکی پیس و ترسناکە رەگی هەیە وەك پەلی قرژاڵ. |
| سرطاني | Cancerous | شێرپەنجەیی. |
| سرطان الدم الابيض | Leukemia | ( لۆکیمیا)، شێرپەنجەی خوێنی سپی. |
| سرطان عصبي | Neurolymphoma | شێرپەنجەی دەماریی. |
| سرطان غددي، سرطان غدي | Adeno-carcinoma, Glandulae cancer | شێرپەنجەی گلاندی، شێرپەنجەی لوویی. |
| سرطان ظهاري | Epithelial-cancer | شێرپەنجەی تونخە لینجەی پێست. |
| سرطان اللثة | Vlocarcinoma | شێرپەنجەی پووك. |
| سرطان العين الاسود | Bolbome-lanoma | شێرپەنجەی رەشی چاو. |
| سرطان الرئة | Pneumo-carcinoma | شێرپەنجەی سی. |
| سرطان الثدي | Mastocarcinom | شێرپەنجەی مەمك. |
| سرطان اخضر، كلوروما | Chloroma | ( کلۆرۆما)، جۆرێکی دەگمەنە لە شێرپەنجە، رەنگەکەی سەوزە لەسەر ئێسقانی کەللەی سەر دەردەکەوێت . |
| سرطان النهر، ابو جنيب، خنجل، سلطعون نهري | Crab, Cray fish | قرژاڵی رووبار، چنگار، خەرچنك، کیفژاڵ، قرژانگی رووبار. |
| سرطان البحر ، جراد البحر، خمخم، كركند، سلطعون بحري | Astacues, Lobster | ( ئەستاکەس)، قرژاڵی دەریا، قرژانگی دەریا، کوللەی دەریا. |

| | | |
|---|---|---|
| سرطان ناسك | Hermit crab | قرژاڵی پەرستەمەند، قرژاڵی قاقڵەدار، قرژاڵێکە لەقاقڵەی بەتاڵی قاقڵە جنۆکەدا دەژی. |
| سرطان البحر الشائك | Spiny lobster | قرژاڵی دڕکاوی دەریا. |
| سرطان الملك | King ceab | شاقرژاڵ، قرژاڵی شایانە، گیاندارێکە لە کۆمەڵەی دووپشك و جاڵجاڵۆکە ، لەشەکەی لە ناڵی وولاخ دەچێت . |
| سرطان سنونوي | Swallow crab | قرژاڵی پەرەسێلکەیی، جۆرێکە لە قرژاڵ لە پەرەسێلکە دەچێت . |
| سرطان عنكبوتي | Spider crab, Thomisids | قرژاڵی جاڵجاڵۆکەیی، جۆرێکە لە قرژاڵ لە جاڵجاڵۆکە دەچێت ، لاقی درێژ و باریکە . |
| سرطانية، حشرة السرطان | Carabus | جۆرێکە لە قالۆنچەی شاخدار . |
| سرعوب ، ابن عرس | Weasel | مشکی خورما، راسو، گیاندارێکە لە دەڵەك دەچێت . |
| سرعة | Speed, Rate, Velocity, Haste, Rabidity | زووبەزوو، خێرا، خێرایی، چاپووکی، پرتاو، دەسوبردی ، تیژی. |
| سرعة منتظمة | Uniform-velocity | خێرایی رێك و پێك. |
| سرعة غير منتظمة | Ununiform-velocity | خێرایی نارێك و پێك . |
| سرعة الصوت | Speed of sound | خێرایی دەنگ، دەکاتە (١٢٠٠) کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا . |
| سرعة الموجة | Speed of wave | خێرایی شەپۆل. |
| سرعة الضوء | Speed of light | خێرایی رووناکی، دەکاتە ( ٣) ملیۆن کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا. |
| سرعة نسبية | Relative-speed, Relative velocity | خێرایی رادەیی. |
| سرعة فوق الصوتية | Super sonic speed | خێرایی ژوورووی دەنگ، هەر خێراییەك کە لە خێرایی دەنگ زیاتر دەبێت ، واتە لە نێوانی (١-٥) ئەوەندەی خێرایی دەنگ. |
| سرعة دون الصوتية | Subsonic speed | خێرایی ژێرەوەی دەنگ، واتە کەمتر لە (٧٤١) میل لە کاتژمێرێکدا. |
| سرعة الذوبان | Speed of solution | خێرایی توانەوە. |
| سرعة التنفس | Polypnea | خێرایی هەناسەدان. |
| سرعة النبض | Rusle vote | خێرایی پرتە. |
| سرعة التنفس من ارتفاع الحرارة | Thermopdy-pnea | خێرایی هەناسەدان لەبەر بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش. |
| سرعة التفاعل | Reaction-velocity | خێرایی کارلێك |
| سرعة الإفلات | Escape-velocity | خێرایی دەربازبوون، ئەو خێراییەی کە دەبێت رۆکێت ( مووشەك) بیگاتێ بۆ ئەوەی بتوانێت لە هێزی راکێشانی زەوی دەرباز بێت . |
| سرعة النفاذ | Exhaust- velocity | خێرایی گوزەرکردن. |
| سرعة انتهائية | Terminal-velocity | خێرایی کۆتایی. |
| سرعة فضائية | Space velocity | خێرایی بۆشایی، خێرایی سوورانەوەی ئەستێرەیەك بە نیسبەت خۆرەوە . |
| سرعة مدارية | Orbital-velocity | خێرایی سوورگەیی. |
| سرعة التصادم | Impact-velocity | خێرایی بەریەك کەوتن، خێرایی گوللەیەکی تەقێنراو. |
| سرعةقصوى | Speed limit | ئەوپەڕی خێرایی. |
| سرعة زاوية | Angular-velocity | خێرایی گۆشەیی. |
| سرعة فرط صوتية | Hyper sonic speed | خێرایی سەروو دەنگ، ئەو خێراییە کە لە پێنج ئەوەندەی خێرایی دەنگ لە هەوادا زیاتر بێت . |

| | | |
|---|---|---|
| سرعوفة، فرس النبي، حصان العباس، ابو صلاح ، جمل اليهود | Praying-insect, Mantis | مەشکەدڕە، ئەسپی پێغەمبەر ، بالبالووکە، کوللە حاجی، جۆرە کوللەیەکی سەوزە باڵەکەی ڕاستە لەسەر لق و گەڵای ڕووەك خۆی بۆ ڕاوکردنی مێش و مەگەز مات دەدات. |
| سرع، سرعرع | Vine-shoot | لقی داری مێو ئەگەر تەڕوبڕ بێت . |
| سرغة، بيض الارض | | ریشی هەڵۆ، جونگ، چونگ، گوڵەبەهارە، گولێکەزار، جۆرە گیایەکە گولێکی زەردی بۆن خۆش دەگرێت . |
| سرغوس، اسبور، فار البحر | Sargo, Sargus, Mullet | (ساگۆ)، مشکیدەریا ، جۆرێکە لە ماسی لە قەراخ دەریاکانی میسردا دە ژی. |
| سرغند، بخور البربر | Orpine | بفوردی بە ر بە ر،بفوردی سودان ،گیایەکی پزیشکی‌یە. |
| سرغون ، ضفدعة سامة | Poison frog | بۆقەژەهرینە ، جۆرە بۆقیکی ژەهراوییە. |
| سرغوم ، سرغو، نجرو | Sorghum | سۆرگەم ،جۆریکە لە گەنمەشامی ،شیلەیەکی شەکریی لێدەردەهێنرێت. |
| سرغاسو، سرجس | Sargasso | (سارگاسۆ) ،چوزەوارەیەکی (قەوزەیەکی) گەورەی مەیلەو قاوەییە لە دەریا گەرمەکاندا دەژی سەر ئاو دەکەوێت . |
| رفل، سرفيل، حشيشة البرص ، رجل الغرب | Chervil, Cerfolium | گیابەڵەکی ، گیایەکە بۆنەخۆشی بەڵەکی باشە ،لە مەعدەنوس دەچێت. |
| سرفيل مسكي، مرّ، مر حجازي | Myrrh | مایرە، درەختێکە لە کۆمەڵەی بخۆر زەمقێکی ڕێسین لە قەدەکەی دەردەهێنرێت. |
| سرفيلات، | Cervelat | ( سەرڤیلات)، جۆرێکە لە سجووق. |
| سرفيد، سيرفيد | | بروانە ( ذبابة حائمة) |
| سُرفة | Larva, Caterpillar | ( لارڤا) ، کرمۆکە، کرمی مێروو، جۆرە کرمێکی چاوچنۆکی زیان بەخشە لە گەرای مێروو ( مێش و مەگەز) دێتە دەرەوە، دوای هەڵهاتن گەڵا و بە رو تۆوی ڕووەك دەخوات لە دوایی دا خۆی دەخاتە قۆزاخەکەیەوە و مت دەبێت هەتا دەبێت بە مێروویەکی قاچدار و باڵداری تەواو ئەوساکە دێتە دەرەوە . |
| سرفة ناخرة | Canker worm | جۆرە کرمۆکەیەکی مێرووە زیان بە درەختی بەردار دەگەیەنێت . |
| سرفابور | Surveyor | ( سەرڤایۆر)، کەشتی بۆشایی ئەمریکی. |
| سرفوت، سمندل، سمندر | Salamander | (سالەمەندەر)، قوڕناویلکە، گیاندارێکە لە کۆمەڵەی بۆق کلکدارە، چیرۆکێکی ئەفسانەی دەربارە هەیە گوایا مادەیەکی ئاگرکوژێنەوە دەردەدات. |
| سرقة | Stealing, Robbing | دزین. |
| سرقين، زبل | Compost , Dung, Manure, Guano | تەپاڵە، سەرگین، ڕیقنە، زبڵ، شیاکە، کەرمە، قالاخ. |
| سُرق ، مخلدة، خالدة | Everlasting | گوڵە هەمیشە، گوڵە نەمر، گیایەکە گوڵی پەمەیی دەگرێت، گوڵەکەی پارێزگاریی شێوەی ڕەنگی خۆی دەکات بۆ ماوەیەکی زۆر بە وشککردن. |
| سُرقاط | Suricate | (سووریکات)، گیاندارێکی شیردەرە لە ئەفریقای خوارووادا دەژی. |
| سرقوم، سركومة | Sarcoma | (سارکۆما)، جۆرە دومەڵێکی پیسە. |
| سرك، سيرك | Circus | (سێرك)، یاریگەی وڵاخ و گیاندار، کۆڕەپانێکی زۆر گەورەیە غارغارێن و ڕاکردن و بۆکس و زۆرانبازی و زۆرانگرتن لەگەڵ گیانداری دڕندە و هەندێك جاریش چالاکی تیپەکانی نواندنیشی تێدا پیشان دەدرێت. |
| سُرَكّ | Serac | (سێراك)، تۆپەڵە سەهۆڵێکی مەزن لەسەر ڕووی ڕووبار. |
| سركاريا | Cercaria | (سەرکاریا)، یەکێکە لە هەنگاوەکانی سووڕی گەورەبوونی کرمە پانەکان وەکو کرمی بەلهارزیا. |

| | | |
|---|---|---|
| سركة، حجل | Partidge | سوێسکە، جۆرە باڵندەیەکە لە کەو دەچێت. |
| سركوفيل | Sarcophila | مێشی گۆشت، مێشی گۆشتخۆر. |
| سركومة | | بڕوانە (سرقومە). |
| سركمناس | Cercomonas | (سێرکۆمۆناس)، گیاندارێکی سەرەتایی قامچیداری مشەخۆرە دەبێتە هۆی نەخۆشیی. |
| سركوبتس، قراد الجرب | Sarcoptes | گەنەی گەڕی، جۆرە گیاندارێکە. |
| سركودينا، جذري القدم | Sarcodina, Rhizopoda | قاچ رەگی، جۆرە گیاندارێکە وەکوو ئەمیبا. |
| سرلود، ولود بيوض | Ovoviviparous | هێلزۆك، مێرووییەکە گەراکەی لەناو سکیدا هەڵدێت. |
| سُرم، است | Anus, Rectum | کونی قنگ، کۆم، قنگ. |
| سرمدي | Eternal | هەمیشەیی، نەمری، بێ بڕانەوە، سەرەتاو دوایی نەبێت. |
| سُرمان، سِرمان، يعسوب | Yellow-hornet<br>Queenbee<br>Dragongly | (١) زەردە زیرە، جۆرە زەردەواڵەیەکی زۆر پیسە.<br>(٢) شاهەنگ.<br>(٣) پووشکە بە قنگە، جۆرە مێرووییەکە رەنگەکەی سەوز و رەشە. |
| سرماح | Ephippiger | جۆرە کوللەیەکە چزووی درێژی هەیە. |
| سرمِق، قَطَفْ | Orache, Mountain spinach, Chenopod | سپێناغە کێویلە، رووەکێکە لە کاهو دەچێت، دەروێنرێت، گەڵاکەی دەکرێت بە زەڵاتە، دەنکەکەی دەبێتە هۆی رەوانی و رشانەوە. |
| سرمج | | بڕوانە (سراجية). |
| سرماية، راسمال | Capital, Fund | سەرمایە. |
| سرماية | Aalf | کەوش، سۆل. |
| سرنباق، جندفلي، اظفار الطيب | Strombus-gallus, Oyster | لەپکە بۆنخۆشکە، جۆرە لەپکەیەکە (سەدەف) بۆنی خۆشی لێ دەردەهێنرێت. |
| سرنج، محقنة | Syringe | دەرزی پزیشکی، شرینقە. |
| سرنمة، سير في النوم | Sleep walking, Somnambulism | خەوڕەویی، بەدەم خەوەوە ڕۆیشتن. |
| سرنج، فسيفساء، موزاييك | Mosaic | (مۆزایك)، نەخۆشییەکی رووەکییە. |
| سرنته، لسان العصفور | Honey wort | زمانە چۆلەکە، گیایەکی پزیشکیی شیلەدارە، گوڵەکەی زەردەمەنەك تێیی دەرووکێت. |
| سَرنوف | Buzzard | جۆرە هەڵۆیەکی ئاوییە. |
| سَرو، شجرة الحية، شجرة الحياة | Cypress-cupressus | سەروو، سەرف، ئاژەوەن، ئارەوەن، درەختێکە لە هۆزی سنەوبەرەهەمیشە سەوزە، شێوەیەکی قوچەکی هەیە بۆ رازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت، هەندێ جۆری هەیە وەکو: سەرووی پۆیی، سەرووی تان، جۆرە مازوویەك دەگرێت. |
| سرناي | Piccola | زوڕنا، ئامرازێکی مۆسیقایە. |
| سرو افقي | Horizontal-cypress | سەرووی پۆیی. |
| سرو عمودي | Columnar cypress | سەرووی تانی، سەرووی ستوونی. |
| سرو جبلي، عرعر | Juniper tree | هەڤریسك، سەرووە کێویلە، هێڤەر، هاڤریسك، عەرعەر، هەوریس، وەهل. |
| سروال | Drawers | شەرواڵ، دەرپێ، پانتۆڵ، پاوارە، شەڵوال. |
| سَروَلَة، تحجيل | White stockings | بوونی تووکی سپی (پەڵەی سپی) لە لاقی وڵاخدا. |

| | | |
|---|---|---|
| سروال، شروال | Baggy trousers | شەرواڵ. |
| سروال تحتاني | Bloomer | دەرپێ، ساتان. |
| سروال، بنطلون | Trousers | پانتۆڵ. |
| سروء، بيوض | Oviparous | گیانداری هێلکەکەر، گیانداری گەرادانەر. |
| سرياح | Locust | کوللە، کلۆ. |
| سريان | Flowing | تەشەنە، تەنینەوە، داکەوتن. |
| سَرِيةٌ | Detachment, Branch | پەل، لق. |
| سرية | Brook, Streamlet | جۆگەلە. |
| سرير | Bed, Bedstead, Thalamus | چارپایە، بێشکە، ئەرزیل، تەختی نووستن، قەرەوێڵە. |
| سرير الملك، عرش | Throne | تەختی پاشایی. |
| سرير خشبي | Wooden bed | ئەزیل، قەرەوێڵەی تەختە. |
| سرير الهز | | جۆلانەی منداڵان، جۆرە یارییەکی منداڵانەیە. |
| سرير المخ | Diencephalon, Thalamence-phalon | بێشکەی مێشك، ئەرزیلی مێشك، مێشکی ناوەڕاست. |
| سرير معلق ، هامك | Hammock | دیلانێ، جۆلانەی هەڵواسراو لە نێوانی دوو درەختدا. |
| سرير النهار | Day bed | قەرەوێڵەی ڕۆژ، قەرەوێڵەیەکی تەسکە بەڕۆژ دەکرێت بە قەنەفە. |
| سرير بصري | Optic-thalamus | بێشکەی چاو، بەشێکە لە مێشك. |
| سُري | Umbilical, Hilar | ناوکی، پەیوەندی بەناوکی سکی گیاندارەوە هەبێت. |
| سُري، سرو كاذب | Chamaecyparis | سەرۆکە، درەختێکە لە سەروو دەچێت لە کۆمەڵەی کاژە. |
| سري، غير ظاهر | Secret, Mysterious | نەپەنی، نەدار، نهێنی. |
| سريرة، نية | Heart-mind | نیەت، نیاز. |
| سريري | Clinical | هەناویی، شتێك پەیوەندی هەبێت بە هەناوەوە. |
| سرير الطفل ، مهد | Crib, Cot | بێشکە، جۆلانێی منداڵ، لانکە. |
| سريع | Fast, Quick | خێرا، گورج، بلەز، زوو. |
| سريع الذبول | Fagacious | زوو سیس، وەکو گوڵ کە زوو سیس دەبێت. |
| سريع التنفس | Polpreic | هەناسە خێرا. |
| سريع الانفعال | Excitable, Sensitive | زوو شپرزە، کەسێك زوو تێك بچێت لەباری دەروونییەوە. |
| سريع الطبخ | Cook too much, Tooverdo | بەکڵۆك، بە کوڵ، کوڵك، ئەم نۆکە بە کڵۆکە، واتە زوو دەکوڵێت. |
| سريسين | Silkgelatin-Sericin | جەلاتینی ئاوریشمی. |
| سريس، هندباء | Endive | کاسنی، ڕووەکێکی گیایی تەمەن درێژەو گەڵاکەی ددانداره، گەلێك جۆری هەیە هەندێکی دەکرێت بە زەڵاتە، هەندێکی لە پزیشکیدا بۆ ڕەوانی بەکاردێت و لە ڕەگی هەندێکیان مادەی کاوچۆك دەردەهێنرێت. |
| سريسيت | Sericite | (سیریسیت)، جۆرێکە لە مادەی میکای سپی. |
| سرينة، صفارة الانذار | Siren | (سیرین)، ئامرازێکە (شاورێکە) بەکاری تەوژمی هەوا یان هەڵم دەنگ پەیدادەکات لە کارگەکاندا بەکاردێت، بۆ دیاری کردنی کاتی دەست بەئیش کردن و لێبوونەوە. |
| سريش، برواق، عنصل، بصل الشيطان | Road, Asphodelus | سرێش، جافیلۆك، گیایەکە لە کۆمەڵەی زەمەق، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووییەکی جوانە. |

| | | |
|---|---|---|
| شريغ | Didelphus | (ساریگ)، گیاندارێکی توورەکەدارە بەسەر درەختەوە دەژی، مشك و مار دەخوات. |
| سريجة | Ephippium | گەرای کێچی ئاوی کە سەر ئاو دەکەوێت. |
| سريحو بائع متجول | Street-Vendor | چەرچی، کۆلگێڕ. |
| سرية خيالة | Squadron | (ئۆسکۆندرۆن)، پەلێك لە ئەسپ سوار، تاقمە سوار. |
| سريسيدا | Horn-tails | (سریسیدا)، جۆرە مێرووەیەکی باڵ پەردەییە زیان بە درەخت دەگەیەنێتز |
| سسكن | Siskin | (سیسکین)، جۆرێکە لە چۆلەکە. |
| سصلق، سوسليق | Souslik | (سوسیلك)، جۆرێکە لە سمۆرەی زەوی. |
| سطام، محراك النار | Poker | کۆلەوژ، کۆلەوژی تەنوور، ئەوشیشەی کە ئاگری ناو تەنووری پێ خۆش دەکرێت. |
| سطام | Plug, Stopper | (پلاك)، دەمەوانە، سەرقاپ، پشك. |
| سطاقس، سطاخين، حشيشة الجرح، بقلة الأم | Stachys, Wound Wort, Mother wort | گیابرین، گیادایکە، گیا، دەوەنێکە گوڵی بۆنخۆش دەگرێت، شیر لە مێدا زۆر دەکات و بەهێزکەرە. |
| سطح | Surface | روو، رووکار. |
| سطح مستوي | Level Surface, Plane | رووی تەخت. |
| سطح منحني | Curved- Surface, Curved-Plane | رووی چەماوە. |
| سطح التبريد | Cooling- Surface | رووی ساردکردنەوە. |
| سطح مائل | Inclined-plane | رووی لار. |
| سطح التلامس | Contact- Surface | رووی بەریەککەوتن. |
| سطح خشن | Rough- Surface | رووی زبر، رووی زوور. |
| سطح أملس، سطح ناعم | Smooth- Surface | رووی لووس، رووی ساف. |
| سطح كروي | Spherical- Surface | رووی خڕ. |
| سطح الشمس النير، كرة ضوئية | Photosphere | رووی رووناکی خۆر، خڕۆکەی رووناکی. |
| سطح البيت | House-top, Terrace, Roof | سەربان، بان. |
| سطح بطني | Abdominal- Surface | رووی سك، دیوی دەرەوەی سك. |
| سطح انسياب هوائي | Airfoil | هەر رووبەك (وەکو باڵ) کە ئامادە کرابێت بۆ یارمەتیدانی بەرزبوونەوەی فڕۆکە لە ڕێگەی تەوژمی هەواوە. |
| سطح التحكم | Control- Surface | رووی دابینکردن، ئەو رووە جوڵاوەی بۆ گۆڕینی بار و بەرزبوونەوە و خێرایی فڕۆکە بەکاردێت. |
| سطح فمي | Oral Surface | رووی دەمی. |
| سطحي | Superficial, Acrotic | رووبی، یەکێك کە تەنیا سەیری دیوی دەرەوەی شت یان رووداو بکات. |
| سطح هلالي، غضروف هلالي | Meniscus | کرکراگەی داسی، خەپلەیەکی کرکراگەیی داسولکە شێوەیە بە سەری ئێسکی هەندێك لە جومگەکانی لەشەوە وەکوو لە ئەژنۆدا. |
| سطر، خط | Line | دێڕ، ریز. |
| سطرة | A slap, Spank, Facer | شەپازلە، شەقازلە. |
| سطح، سطوح | Radiance, Great brightness | رووناکدانەوەیەکی بەتین. |

| | | |
|---|---|---|
| سطل | Bucket, Pail | سەتڵ، پەقرەج، دۆڵکە. |
| سطل جلدي | Leather-bucket | دۆڵچە. |
| سطو | Burglary, Assault | هێرش، هێرش بردن بۆ دزی. |
| سطوريون | | بڕوانە (سحلب). |
| سطوع | Effulgence, Radiance, Great brightness, Glittering | درەوشانەوە، پرشنگدانەوە. |
| سعادى، بردي | Sedge, Carex | زەل، گیایەکە ڕەگەکەی بە ژێر زەویدا بڵاو دەبێتەوە و بەتایبەتی لە زەوی شێداردا دەڕوێت، حەسیر و سەبەتەی لێ دروست دەکرێت. |
| سعادين، هجرس، نسناس | Nissnass Cephus, Monkey, Cebus, Sabaeus | (نەسناس)، جۆرە مەیموونێکی کلك درێژە، بە ڕەنگی سەوز و قاوەیی و سوور. |
| سعال | Cough, Tussis, Anabole | کۆکە، کۆخە، کخك، کۆکین، قفە، قۆزە، کۆخین. |
| سعال ديكي، شاهوق | Hooping cough, Whooping cough, Chin-cough, Kin-cough, Bexconvulsiva, Perlussis | کۆکەڕەشە، کۆخەڕەشە، قورباجە، خەندەکۆکە، کۆکەی دوودەنگی. |
| سعال جاف | Dry cough | وشکە کۆکە. |
| سعال قشعي | Productive cough | تەڕەکۆکە، کۆکەی پێگەیشتوو. |
| سعال الخيول | Horse cough | کەتەو، کۆکەی وڵاخ. |
| سعال الغنم | Sheep cough, Hoose | کۆکەی مەڕ و ماڵات، نەخۆشییەکە تووشی مەڕ و ماڵات دەبێ بەهۆی کرمێکی مشەخۆری دەزوولەیی پێی دەگوترێت (فیلاریا) لە سییەکاندا. |
| سعال تشنجي | | بڕوانە (سعال ديكي). |
| سعالي | Gorgonam | (گۆرگۆنام)، جۆرێکە لە مەیموون. |
| سعالي | | گیایەکە گەڵاکەی وەك ڕەگ وایە، گوڵەکەی زەردە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| سُعار، كلب، سُعر، سعور، داء الكلب | Hydrophobia, Rabies | هاری، نەخۆشییەکە لە سەگەوە دادەکەوێت. |
| سُعاط | Fragrance | بۆنی خۆش. |
| سعة | Capacity, Amplitude | فراوانیی، قەوارە، گونجایش، فرەهی. |
| سعة الموجة | Wave Amplitude | فراوانیی شەپۆل. |
| سعة حرارية | Thermal-capacity, Heatcapacity | فراوانیی گەرمایی. |
| سعة كهربائية | Electric capacitance | فراوانیی کارەبایی. |
| سعة الذبذبة | Amplotude of vibration | فراوانیی لەرە، لەرەفراوانی. |
| سعتر، صعتر، زعتر | Thyme, Thymus | جاترە، کاکوتی، هەزبیلە کێویلە، مەرزە کێویلە، ئەزبیلە، ئەزبی، هەزبی، هەزبیلە، گیایەکی بۆنخۆشە گوڵەکەی سپییەکی مەیلەو پەمەییە بۆ مەبەستی پزیشکی و بەهارات و دەرهێنانی بۆنی خۆش بەکاردێت. |
| سعتر هندي | Indian Thyme | جاترەی هیندی، جۆرە گیایەکە دەکرێت بە بەهارات. |
| سعتر بَري، نمام الملك، سيسنبر | Wild Thyme | جاترە کێویلە. |

| | | |
|---|---|---|
| سُعدان، قرد | Ape | عەنتەر، نێرە مەیموون، مەیموونێکی ناشرینی کەتەیە کلکی کورتە لە ئاسیا و ئەفریقادا دەژی. |
| سعدان عنكبوتي | Spider monkey | مەیموونی جاڵجاڵۆکەیی، جاڵجاڵۆکە مەیوون، جۆرە مەیموونێکە کلکی درێژە، دەپێچێت لە لقی درەختەوە، لەشی بچووکە، پەلەکانی درێژ و لاوازن. |
| سعدان، سعد | Neurada procumbens | کاوێر، رووەکێکی درکاوییە بۆ لەوەڕ باشە، درکەکەی ووشك دەبێت، لە گۆی مەمك دەچێت. |
| سعدانة، حلمة | Nipple, Teat | گۆی مەمك. |
| سعدانة (سعدانات) | Condylomata | دومەڵی نەخۆشیی فەرەنگی. |
| سعد ناشرة | Capricorni | دوو ئەستێرەن لە کۆمەڵەی کارژۆڵە. |
| سعد السعود | B-Aquarii | کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| سعدانة، حمامة | Pigeon, Dove | کۆتر. |
| سُعْد، علوب، رزين، صباح الخير، حب الزلم، سعد ماكول، سخاب | Nut grass, Galingale, Cyperus, Earth-almond | (١) سەل، گیایەکی گەڵا باریکە لە کۆمەڵەی دەغل و دان، سەلکێکی بچووکی رەشی بۆنخۆشی هەیە، دەکرێتە دەرمان بۆ بەهێزکردنی پووك یا وەك ملوانکە کونی دەکەن و دەیهۆننەوە.<br>(٢) قوراوە، قوریجان، قورادە، رووەکێکی پیازییە گەڵاکەی لە گەڵای کەوەر دەچێت. |
| سعْد البهائم، سعد البهام | Pegasi, Baham | (پیگاسی)، دوو ئەستێرەن. |
| سعد بالع | Aquarius | کەلووی دۆلکە، ئاوڕێژ، ئاوکێش، یەکێکە لە ماڵەکانی (دانشگاکانی) مانگ. |
| سِعر | Price, Rate, Cost | نرخ، بەها، قازانجی سەد دینار لە ساڵێکدا. |
| سعر السوق | Market price | نرخی بازاڕ، نرخی شتومەك لە بازاڕدا. |
| سَعْر، مكلوب | Rabietic | هار، وەکو سەگی هار. |
| سُعرة، سعرة حرارية | Calory-calorie | کالۆری، گەرمۆکە، یەکەی پێوانی بڕی گەرمی، بڕی ئەو گەرمییەی کە پێویستە بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی یەك گرام لە ئاو بە یەك پلەی گەرمی. |
| سعران، أناباز | Anabasis | (ئەناباس)، دەوەنێکی کێوییە جلی پێ دەشۆرێت. |
| سَعَف، سُعاف، سعفة الأظافر | Onychophyton | قڵیشانی پێستی دەوری نینۆك. |
| سَعَف، سُعفة، سَلعة | Wen, Ulcer | خەرکانە، برینێکە لە دەمی وشتردا پەیدا دەبێت، لە گەڕیی دەچێت، یان لە دەم و چاوی منداڵدا پەیدا دەبێت. |
| سعفة، قوباء حلقية، قراع عسلي | Ring worm, Tinea, Porrigo | کەچەڵیی، نەخۆشییەکی پێستی درمە. |
| سَعَف، سَعفة، جريد النخل | Palmleaf | گەڵای دارخورما. |
| سعفة | Palmella | (پالمیلا)، جۆرە قەوزەیەکە لە ئاوی شیریندا دەژی. |
| سعفة، قوبعة | Moth, Tinea | مۆرانە، مێروویەکی زیانبەخشە. |
| سَعَل، سُعال | | بڕوانە (سعال). |
| سِعلاة، شهام، انسان وحشي | Orange-outang, Orang-utan | مرۆڤە کێوی، دێڵە مەیموون، مەیموونی مێ، مەیموونی کێوی، مەیموونێکی تووکنە لە مرۆڤ دەچێت، لە دارستانەکانی دوورگەی سۆمەترە دەژی، رەنگەکەی سووری مەیلەو خۆڵەمێشییە. |
| سعلاة، انثى الغول | Ogress, Goblin | دەلە دێو، دێڵە مەیموون. |
| سُعن أبو سُعن، عَنز هندي | Adjutant-bird, Marabou | بزنی هیندی، باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی لەقلەق، توورەکەیەك لەژێر ملیدا هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| سَعوط، اخيليا، بقلة العطاس | Achillea, Milfoil, Yarrow | گیا پشمین، رووەکی هەزار گەڵا، رووەکێکە گوڵچەکەی ناوێتەیە. |
| سُعوط، عطوس | Snuff | برنووتی، دەرمانێکە دەکرێتە لووتەوە بۆ پژمین بریتی‌یە لە هاڕراوەی تووتن دوای خۆشکردن و تێکەڵکردنی لە گەڵ بۆنی خۆش. |
| سعوط، عود العطاس | Sneezwort, Achillea-ptarmica | داری برنووتی، جۆرە رووەکێکە. |
| سَعي | Attempt | تەقەلا، کۆشش، خەباتکردن. |
| سَعير، ماكاك ميمون، قرد خنزيري | Macaque-maimon | بەرازە مەیموون، مەیموون بەراز، جۆرە مەیموونێکە کلکی لە کلکی بەراز دەچێت، لە دوورگەی مەلاقە دەژی. |
| سعير النار | Blazing of fire, Glowing of fire | گڕی ئاگر. |
| سعيقة العين، الماء الأزرق في العين، غلوكوما، شدة توتر العين | Glaucoma | (گلوکۆما)، ئاوی رەش، ئاوی شین، ئاوی شینی چاو کە دایەت، نەخۆشی‌یەکە تووشی شلاوی چاو دەبێت. |
| سَغَب، جوع | Hunger, Starvation | برسێتی. |
| سَغَل، نقص التغذية | Dystrophy, Dystrophia | کەمخۆراکی، خۆراك کەمیی، ناڕێکیی خۆراك خواردن. |
| سفع، سفع اونان | External spermatismus | ئاوهاتنەوەی پیاو لە دەرەوە، ئاو هێنانەوەی پیاو لە دەرەوەی لەشی ئافرەتدا، قەدەغەکردنی ئاو هاتنەوە لە لەشی ئافرەتدا. |
| سفّ، علسة | Cephus | (سیفەس)، مێروویەکی زیانبەخشە بە رووەك. |
| سفّ، سُبّ، حية قفازة | Zamenis | کەومار، تیرەمار، مارێکی درێژو باریکە بە سەر بەرددا باز دەدات، وەکو بفرێت وایە. |
| سفاة، مُروق، لحية، شوك السنبل | Beard, Barb, Awn | قەڵاس، رێشووی تۆوی رووەك. |
| سفاليريت، زينك بلند | Sphalerite, Zinc blende | (سفالیریت)، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی توتیا (زینك)، بە شێوەی گۆگردیدی زینك، رەنگەکەی زەرد یان قاوەیی یان رەش یان سوورە. |
| سفاح، زِنى | Fornication, Adultery, Lewdness | جووتگرتن بە حەرامی، داوێن پیسیی. |
| سَفّاح | Shedder of blood, Sanguinary | خوێنڕێژ. |
| سَفانة | Pearl | مرواری، مادەیەکی سپیی خڕی بریسکەدارە لە لایەن لەپکەی گوێچکە ماسی‌یەوە دەردەدرێت و بە شێوەی خشڵ بەکاردێت. |
| سفالة | Foot, Lower part | دامێن، خوارەوە، پەینگان. |
| سفاد نزو، بَك، جماع، نزاء | Copulation, Coitus, Coition | پەڕین، جووتگرتنی گیاندار. |
| سَفارة | Embassy | باڵوێزخانە. |
| سفانة، صناعة السفن | Ship building | پاپۆڕ دروستکردن. |
| سَفان | Ship bulder, Sailor | کەشتیوان، کەشتیەوان. |
| سفة | Powder | هاڕراوە، سکوف، سفوف. |
| سفح الريح | Direction of wind | ڕێڕەوی با، ئاراستەی با. |
| سفح الجبل | Foot of mountain, Scree | بنار، دامێنی شاخ، دامەنی شاخ، قەدپاڵ، داوێنی کێو، دامێنی چیا. |
| سفديل، حشيشة القمل | Cevadilla, Cebadilla | گیا ئەسپێ، گیایەکی پزیشکی‌یە گوڵی ئەرخەوانیی مەیلەو رەش دەگرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| سفرة، خوان، ترابيزة السفرة، مائدة | Diningtable, Tabella | خوان، سفره، مێزی نانخواردن. |
| سفرة، رحلة | Journey, Voyage, Tour | گەشت، سەفەر، گەشت و گوزار. |
| سفر عبر الفضاء | Spacetravel, Astronautice | گەشت بە نێوان بۆشایی ئاسماندا ، گەشتی ئاسمانی. |
| سفراس، سفرس، شمار بحري | Saxifrage, Rock foil | رازیانەی دەریا، جۆرە رووەکێکە تونکلەکەی بە شێوەی دەرمان بۆ ئارەقکردنەوە و مێزکردن و فڕیدانی لم و بەردی گورچیلە بەکاردێت . |
| سفرانين | Safranin | ( سافرانین)، رەنگێکی رووەکی‌یە . |
| سفرجل، حيوة | Quince | بەهیٚ، بەی، بهۆك، بیۆك، بە، بهنۆك، بەیانە، درەختێکی بەردارە، بەرێکی زەردی مەیلەو سەوزی گەورەی هەیە، شیرین و مەیلەو تفتە دەخورێت یان دەکرێت بە مرەبا . |
| سفرجل هندي، قشدة | Anona, Annona-squamosa | بەهێی هیندی، درەختێکە بەرەکەی لە بەری بەهیٚ دەچێت. |
| سفرجلية، | Oriental-manna, | ١. بەمیۆکە، بەهیٚ درۆزنە، رووەکێکە ئاوەکەی بۆ گرانەتا باشە. |
| سفرجل كاذب | Cotoneaster, False quince | ٢. رووەکێکە گەڵاکەی مێخەکی‌یە، بەرەکەی خڕ و شیلانەیی‌یە. |
| سفرجي، نديل | Waiter, Butler | سفرەچی، ئەو کەسەی کە لە چێشتخانەدا سفرە و کەل و پەلی خواردن ریز دەکات. |
| سفرنة، سفرناية | Sea-pike, Sphyraena | ( سەفرینە)، جۆرە ماسی‌یەکە پەرەکەکەی درکاوی‌یە . |
| سفط | Scale | تونکلٚ ، پوولەکەی ماسی . |
| سفط، سلة | Basket | سەبەتە ، سەوە، سەفی. |
| سفط | Suction | مێزی پاڵپێوەنانی هەوا بۆ بەرزکردنەوەی شلە . |
| سفع، حرق سطحي، تشويط | Singeing | هەڵکزاندن، هەڵبرووزاندن، هەڵکرووزاندن، چزەچز، پرووزە، داپلۆخان . |
| سفعة، ومحة | Sunburn | هەتاوبردن . |
| سفع الوجه، لفحة | To tan the face | کاری گەرما بەسەر دەم و چاودا . |
| سُفعة | Seed of colocynth, Seed of oleander | دەنکی گوژاڵك، دەنکی ژاڵە. |
| سفع الاطراف | Tipborn | سووتانی قەراغی گەڵای رووەك بە کاری وشکی و گەرما وەکو لە گەڵای پەتاتەدا . |
| سفعة حنارية | Rim-fire | مردنی گەڵای رووەك لە ئەنجامی کەمی پۆتاس لە خۆراکەکەیدا. |
| سفعة | Black spot | پەڵەی رەش. |
| سُفع الشمس | Maculae | پەڵەی رەشی سەر رووی خۆر. |
| سفك، اراقة | Pouring out, Shedding | رژاندن، رشتن . |
| سفلس ، افرنجي ، زهري | Syphilis, Verole, Lues, Chandcre | فەرەنگی ، ئاتەشەك، هالە، ئاڵە. |
| سفلس الدجاج، زهري الدجاج | Spiro-chetosis | فەرەنگی مریشك، نەخۆشی‌یەکی درمی کوشندەیە تووشی باڵندەی ماڵی دەبێت . |
| سفلس ( في الحيوان) | Bad-disorder | هالە ، فەرەنگی، بەڵەك بوونی ئاوگەڵی چارەویٚ. |
| سفلس جلدي | Syphilid, Syphiloderma | فەرەنگی پێست . |
| سفلي | Inferior, Lower | خواروو، ژێرەوە.، |

| | | |
|---|---|---|
| سفليات المنخرين | Catarrhina | لووت نزمەکان، کۆمەڵێکە لە مەیموون ، کونە لووتیان کەوتۆتە ژێرەوە کلکیان کورتە یان بێ‌کلکن . |
| سفن، سیفن، ورنك، شفنین البحر، حصیرة | Ray, Skate | ( رای)، ( سکێت)، ماسییە حەسیرە، جۆرە ماسییەکی دەریاییە پشتەکەی دڕکاوییە ، پانکەڵە و کلك درێژە. |
| سفنة | Siphneus | ( سیفنەس)، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە مشك دەچێت. |
| سفند لیون | Heracleum-sphondylium, Cowparsnip, Hogweed | گیابەران، گیایەکە بۆ لەوەڕی بەراز باشە. |
| سفنج، اسفنج | Sponge | ئیسفەنج هەوری، گیاندارێکی ئاوی ساکارە، پەیکەرێکی نەرمی کون کونی هەیە ، بۆ گەلێك مەبەست سوودی لێوەردەگیرێت . |
| سفند | White-mustard | خەرتەلیە سپی. |
| سفندر، حب النار | Ruscus, Alexandrian-laurel | سەفەندەر، دەنکی ئاگرو گیایەکە لە کۆمەڵەی زەمەق، بەرەکەی لە تری دەچێت تۆوەکەی ڕەشە دەرمانی میز پێکردن لە ڕەگەکەی دەردەهێنرێت. |
| سُفُور | Prickly globe-fish | جۆرە ماسییەکی خڕی دڕکاوییە . |
| سفور، کرعان، قنف البحر ، توتیا البحر | Sea-urchin, Sea-hedge-hog | ژیشکی دەریا، جۆرە گیاندارێکی لەپکە داری خڕی دڕکاوییە گۆشتەکەی دەخورێت . |
| سفود، سیخ | Spit, Skewer | شیشی ئاسن، شیشی کەباب یا گۆشت برژاندن. |
| سفود البندقیة | Gun-spit ,Gun skewer | زمە، زمەی تفەنگ. |
| سفوف | Powder | سکووف، سفووف، هاڕاوەیەکی شیرینی کەمێك تاڵی بۆن خۆشە بۆ سك ئێشە دەردەرێت بە منداڵ. |
| سفوریة | Ploypogon | گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغلودان، قەڵسدارە . |
| سفون، رکیب | Blue grass | گیاشینە، گیایەکی کێوییە لە کۆمەڵەی دەغلودان ، بۆ لەوەڕ باشە. |
| سفیداج، اسفیداج | Lead white | سپیاو، تۆزێکی سپییە، ژنان بۆ ئارایشت بەکاری دەهێنن. |
| سفیر | Ambassador | باڵیۆز. |
| سفیر، صفیر، لازورد | Sapphire | ( سافیر)، یاقووتی شین، لاجیوەرد، بریتییە لە ئۆکسیدی ئەلەمنیۆم ( ئەلومینا). |
| سفیرومتر | Spherometer | ( سفیرۆمەتر)، خڕی پێو، ئامرازێکە بۆ پێوانی ڕادەی خڕیی |
| سفینة، برج السفینة | Ship, Argo | بورجی کەشتی، کەلووی پاپۆر، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| سفیجوغراف | Sephygmograph | ( سفیگمۆگراف)، ئامرازێکە بۆ وێنەگرتنی پرتەی دڵ . |
| سفین، اسفین | Wedge | پواز. |
| سفینة | Ship, Boat | کەشتی ، گەمی. |
| سفینة حربیة، بارجة | Battle ship, Monitor | کەشتی جەنگی . |
| سفینة قتال کبیرة | Ship of the line | کەشتی جەنگی گەورە . |
| سفینة تجاریة | Commercial-ship, Cargo boat | کەشتی بازرگانی. |
| سفینة شق الجلید، سفینة کسر الجلید | Ice-boat, Ice breaker | کەشتی سەهۆڵ شکێن، کەشتییەکە سەهۆڵی سەر ڕووی گۆم و دەریاکان دەشکێنێت . |
| سفینة مدفعیة | Gun boat | کەشتی تۆپدار، واتە تۆپی لەسەر دامەزرابێت . |
| سفینة بخاریة، باخرة | Steam ship, Steam boat | کەشتی هەڵمی، پاپۆر. |

| | | |
|---|---|---|
| سفينة شراعية | Sail boat | کەشتی بایەوان، کەشتیی هەوایی، کەشتی چارۆکەدار. |
| سفينة فضائية ، عربة فضائية | Space craft, Space Ship | کەشتی بۆشایی، کەشتیی ئاسمانیی، ئەو کەشتییەی کە مرۆڤی تێ دەچێت و بەهۆی مووشەکەوە (ساروخەوە) لە هێزی راکێشانی زەوی دەکرێتە دەرەوە بۆ بۆشایی ئاسمان بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی هەوا و ئەستێرەکان. |
| سفينة ذرية | Atomic ship | کەشتی ئەتۆمی، کەشتییەکە بە ووزەی ئەتۆم کاردەکات. |
| سفينة هوائية | Air ship, Air craft | کەشتیی هەوایی، کەشتیی ئاسمانی. |
| سفينة صيد | Hunting ship, Catcher vessel | کەشتیی راو، پاپۆری راو. |
| فينة مدرعة | Armoured-ship | کەشتیی زرێپۆش، کەشتیی زرێدار. |
| سفينة نسّافة | Torpedo-boat | کەشتیی رووخێنەر، کەشتییەکی جەنگیی خێرایە بەهۆی دەزگایەکەوە کە تیایەتی بۆمبا دەگرێتە کەشتیی دوژمن و تێکی دەشکێنێت. |
| سفينة برتغالية، رجل الحرب البرتغالي | Portuguese man of war, Physalia | (فیزیلیا)، کەشتی پورتوگالی، کۆمەڵەگیاندارێکی ئاوییە لە شێوەی بۆریدایە لەشی رەحەتی درکاویی پێوەیە بە سەری کۆمەڵەکەوە توورەکەیەك هەیە جاری وا هەیە هێندەی سەری منداڵێك گەورە دەبێ. ئەمیش، بەسەرەکەیەوە پۆپنەیەك هەیە کۆمەڵەکە سەرئاو دەخات، رەنگی توورەکەکە لە نێوانی سوور و شین و بنەوشەییدایە. ئەم کۆمەڵە گیاندارە تەوژمێکی کارەبا پەیدا دەکەن و دەیگرنە گیانداری تر وەکوو ماسی و پەکی دەخەن و دەیخۆن، بەزۆریی لە دەریا گەرمەکاندا دەژین، بۆ مرۆڤیش ترسناکن. |
| سفينودون | Sphenodon | (سفینۆدۆن)، جۆرە گیاندارێکی خشۆکە لە مارمێلکە دەچێت و درێژییەکەی دوو پێ دەبێت، سەرەکەی لمۆزدارە، لە دوورگەی نیوزیلەندە دەژی. |
| سفين | Sphene, Titanite | (سفین)، (تیتانیت)، کەرەسەیەکی خاوە سلیکاتی کالیسیۆم و تیتانیۆمی تیادایە، رەنگەکەی قاوەییە، بەڵام هەندێك جار زەرد یان سەوز یان خۆڵەمێشییە بە شێوەی بەردی بەنرخ بەکاردێت. |
| سقاء، بجع، حوصل، ابو جراب، ابو قربة، جمل الماء، ابو سعن، ابو شلبة | Pelican | سەقاقوش، جۆرە باڵندەیەکی ئاوییە دەنووکی پان و گەورەیە توورەکەیەك وا بە ژێر ملییەوە ماسیی تێدا هەڵدەگرێت. |
| سقا، شكوة، زق، ممخضة | Churn, Water skin | مەشکە، شتێکە لە پێست کراوە ماستی تێدا دەژەنرێت بۆ جیاکردنەوەی کەرەکەی. |
| سقّاء | Water-carrier | ئاوکێش. |
| سقاء | Water guardian | میراو، ئەو کەسەی کە چاودێری ئاو دابەشکردن دەکات. |
| سقاطة الباب، مزلاج | Latch | سوورگی دەرگا، کێلوونی دەرگا. |
| سقاطة، طراقة الباب | Knocker | لێدەری دەرگا، ئەو دەسکەی کە دەرگای پێ لێ دەدرێت. |
| سقاطة المعادن، خبث | Dross | تڵپە، کەفی کانزا. |
| سقاطة، ماسكة | Pawl | گیرە، جۆرە ئامرازێکە. |
| سُقاطة | Dreg, sediment | زۆڵەك، زۆڵەکی نۆك، بیژۆك، میوەیەك یان تۆوێکی سیخنی نارێك. |
| سقاط | Breeze | زاراوەیەکی گشتییە بە خۆڵەمێشی ئاگردان و خەڵووزی کوکی ورد و پاشماوەی سووتانی ناو فڕنەکان دەگوترێت. |
| سقاوة، صقر حوام | Buteo, Buzzard | جۆرێکە لە هەڵۆ، گیاندارە قرتێنەرە بچووکەکان دەخوات. |

| | | |
|---|---|---|
| سقاو، سقاوة، خناق الخيل، سراجة، نحطة، علة المنقافا، رعام ديبة الخيل | Strangles, Glander, Equinia, Hippocoryza, Farcy, Farcin, Farcinia | مەقاو، سەقاو، ئوفە، تەبەق، سەگەناز، پزو، پزگ، پزوپزە، نەخۆشی‌یەکی درمە تووشی ولاخ دەبێت و لە نەخۆشیی (رعام) دەچێت، پەردەی ئەندامی هەناسە دەئاوسێنێت و مادەیەکی چڵمی لێ دێتە دەرەوە. پاشان ژێرملی ولاخەکە دەئاوسێنێت و رەق دەبێت لە دواییشدا دەبێت بە دوومەڵ، ئەم نەخۆشی‌یە تووشی مەڕ و مالاتیش دەبێت. |
| سقام، مرض | Sickness | نەخۆشیی، ناساغی. |
| سقاية | Watering | ئاودان. |
| سقاية، مسقاة | Drinking bow | شوێنی ئاو خواردنەوەی ولاخ و ئاژەڵ. |
| سِقاية عَظاية | Lizard | مارمێلکە، بڵقەدەر، شەوگەرد. |
| سقاية | Ewer | دۆلکە، دۆلکەی ئاو. |
| سقاية الفولاذ | Tempering of steel | دووبارە ڕەقکردنەوەی پۆلا بۆ ئەوەی کە ڕەق و نەرم بێت لە هەمان کاتدا بۆ مەبەستی پیشەسازیی هەمە جۆرە. |
| سقب | Mother-branch | لقێکی رووەك کە تەڕو بڕی ناسك بێت. |
| سقب | Young camel (male) | بێچووی وشتر (نێر). |
| سُقد، سُقدة، حمرة، حميرا | Redstart, Phoenicurus, Estrelda | سوورەباڵە، جۆرە چۆلەکەیەکی سووری دەنووك و قاچ زەردە، یان دەنووکی رەشە پشتی خۆڵەمێشی و سکی سپی و سنگ و کلك و لاق و باڵی سوورە. |
| سَقَر، جهنم | Hades, Tartarus | دۆزەخ. |
| سقر الخيل، عرف الخيل | Mane | یاڵی ولاخ. |
| سقريط | Scarite | (سکارایت)، مێرووییەکی سوود بەخشە لە قالۆنچە دەچێت. |
| سقساق، زقزاق | Plover | زیقاوڵە، باڵندەیەکە لە قەراغ ئاودا دەژی. |
| سقسقة، زقزقة | Chirp, Peep, Pule | جیك جیك، جووکە جووك، جیکە، جریوە، جریوەجریو، زروکە، زروکەزروك، زیقە، زروکاندن، زیقەزیق، چریکە. |
| سقطم، فارة آرية | Arian-mouse | مشکی ئاریی، مشکێکی بچووکی قاوەیی‌یە. |
| سقطوم، الكلب الطائر | Synopterus | سەگی باڵدار، سەگی بڕندە، جۆرێکە لە شەمشەمەکوێرە. |
| سقطون | Sacaton | (ساکاتۆن)، گیایەکە کای لێ دروست دەکرێت. |
| سقط (في الأنسان) | A miscarriage, Abortus | منالی لەبارچوو. |
| سقط (في الحيوان) | Slink | بەرخۆلەی لەبارچوو (لە گیانداردا). |
| سِقط، جناح | Wing | باڵ. |
| سقطة، وقعة | A fall | کەوتن. |
| سُقط | Dreg | گەند، خاشاك، سەرکۆزەر. |
| سِقط | Fall out | تەنۆکە کەوتووەکان، ئەو تەنە بچووکانەی کە دەکەونە سەر زەوی لە ئەنجامی تەقینی ناوکی ئەتۆمەوە. |
| سَقف | Roof, Ceiling, Tectorium | بنمیچ، بنساپیتە، سەراپیتە. |
| سقف الحلق، سقف الفم | Palate | مەلاشوو، پانکا دەڤیی، مەلاژگ، ئاسمانەی ناودەم. |
| سقف، غشاء كورتي | Tectorium, Membrane of corti | پەردەی کۆرتی، پەردەیەکە لە ناوەوەی گوێچکەدا. |
| سقف منكسر، سقف محرد | Gambrel roof | جۆرە بنمیچێکە هەر یەکێك لە لاکانی دووجار لێژە. |

| | | |
|---|---|---|
| سقلة | Squilla | (سـكويلا)، گياندارێكى توێكڵداره هێلانه لەژێر قوڕ و بەردى كەنارى دەريـادا دەكات. |
| سقَم، سُقام، وعكة | Illness, Sickness | نەخۆشيى، دەرد. |
| سقمونيا، محمودة | Scammony | خەشيك، شيره خوشيلك، گيايەكى پزيشكيى خۆهەڵواسه، لە كۆمەڵەى لاولاو، گوڵەكـەى زەرده، زەمقێكـى ڕێسـينى ڕەوانكـەر لـه ڕەگەكـەى دەردەهێنرێت. |
| سقمري، أسقمري | Scomboid, Scomber, Mackerel | (سكۆمبەر)، جۆره ماسىيەكى دەرياييه و پەرەكەى دڕكاوييه. |
| سقنقور، اسقنقور | Skink | شـەوگەرد، جـۆره گيـاندارێكى خشـۆكه لـه ناوچـه گەرمـەكاندا دەژى لـه مارمێلكه گەورەتره، كلكى كورت و ئەستووره. |
| سقوط | Falling, Incidence | كەوتن، كەوتنه خوارەوه، وەرين، هەڵوەرين، گلان، تلان. |
| سقوط الشرج | Prolapsis anus | پوز دەرچوون، كۆم دەرهاتن. |
| سقوطر، سكوتر | Scoter | (سكۆتەر)، جۆره مراوييەكى دەريايى يه. |
| سقوط الأوراق (في الخريف) | Deciduous leaves | گەڵاڕێزان، گەڵاخەزان. |
| سقوط الريش | Pelade | پەڕ وەرين، نەخۆشىيەكه تووشى باڵنده دەبێت. |
| سقورديون، ثومبري، ثوم الحية | Scordium | سيره كێويله، سيرەمارانه، گيايەكه له سيرى ئاسايى بچووكتره. |
| سقوردين | Scordein | (سـكۆردين)، مادەيـەكى زەردى بۆنخۆشـه لـه سـيرەمارانه دەردەهێنرێت. |
| سقوط شعر الحواجب | Defluxion | وەرينى برۆ. |
| سقوط رمش العين، سقوط الأهداب | Ptilosis, Madarosis | كەوتنى برژانگى چاو، وەرينى برژانگى چاو. |
| سقوط الأسنان | Dedentition | ددان كەوتن، دان كەوتن. |
| سقوط الجلد | Keratolysis | پێست فڕێدان، توێك فڕێدان. |
| سقوط الرحم، غشاء ساقط | Decidua | پەردەى مناڵدان كه له كاتى منداڵ بووندا دەكەوێت. |
| سقوط الأظفار | Onychoptosis | كەوتنى نينۆك. |
| سقوط الشعر | Alppecia, Trichorrhea | قژ ڕووتانەوه. |
| سقوط المستقيم | Rectum proplase | داكەوتنى ڕيخۆڵه ڕێكه. |
| سقوط المطر | Rainfall | باران بارين، وارين. |
| سقوط الثلج | To snow | بەفر بارين. |
| سقوب، سكوب، اسقوب | Scup | (سكەپ)، ماسىيەكى دەريايى لەش قوپاوه. |
| سقوطة، سكوتة، قاتل البقر، شوكران | Cicuta, Cowbane | سيكوته، دوڕەست، جۆره ڕووەكێكه گوڵەكەى له چەتر دەچێت گەڵاكەى دەكرێت به مەڵحەم. |
| سقوطين، سكوتين | Cicutin | (سيكوتين)، مادەيەكه له ڕووەكى سيكوته دەردەهێنرێت. |
| سقوف | | بڕوانه (سفوف). |
| سقوم، سوقم، جميز | Sycamore | (كەوت)، سايكامۆر، درەختێكه بەرەكەى له هەنجير دەچێت. تەمەنى درێژه، تەختەكـەى بەنرخـه، بەرەكـەى بچووكـه بـه لقەكانييـەوه نييـه، بـەڵكو بـه قەدەكەيەوەيه. |

| | | |
|---|---|---|
| سقي، سقية، بابيروس، بردي | Papyrus | بەردی، رووەکێکی ئاویی گەڵا پانە، لە قامیش دەچێت، گەڵاکەی دەکرێت بە حەسیر. |
| سقي، تروية | Watering, Irrigation | ئاودان، ئاودێر. |
| سقي الحيد، تطبيع | Tempering | دەمەزەردکردن، ئاودانەوە، جۆشاو، ئاودانی ئاسن بە گەرمکردن و ساردکردنەوەی کتوپڕ و هەمدیسان گەرمکردنەوە. |
| سُقير، عويسق | Kestrel, Lesser kestrel | واشەی بچووک، هەڵۆی بچووک. |
| سقيط، قبوات | Pluck | ئەوشتانەی کە گرنگییەکی ئاوەنجییان هەیە لە قەسابیدا وەکوو سیوجگەر و سەروپێ. |
| سقيط | Nut grass | (١) سمل.<br>(٢) قوراوە، قوریجان. |
| سقيفة، صُفة | Shed, Out house | زنج، قوخ، کەپر، قۆختە. |
| سقيم، عليل | Sick | نەخۆش. |
| سَكّ، فُدس، شبث | Araneus | (ئەرانیەس)، جۆرە جاڵجاڵۆکەیەکە. |
| سك العملة | Coinage, Minting | پارەلێدان، سکەلێدان. |
| سكابيوزة، حشيشة الجرب، جربية، زهرة الجرب | Scabiosa | (سکابیوزا)، گیا کەریی، گیایەکی دەشتەکیی پزیشکییە، گوڵی جوانی هەمەرەنگ دەگرێت. |
| سُكاك | Statosphere | چینی بەرزی هەوا. |
| سكان | Steering | (ستێرن)، سوکان. |
| سكان المركب، دفة | Rudder | ستێرنی پاپۆڕ یان کەشتی. |
| سكاف، اسكاف | Shoemaker | پینەچی، پێڵاودروو. |
| سكافة | Shoemaking | پینە چێتی. |
| سكاكة الأذن، صمع | | گوێچکە بچکۆلەیی، گوێچکە بچووکی. |
| سكان | Population | دانیشتوان، خەڵک. |
| سكابوليت | Scapolite, Wernerite | (سکاپۆلیت)، کانزایە سلیکاتی ئەلەمنیۆم و کالیسیۆم و کاربۆناتی کالیسیۆمی تیادایە، جۆرێکی هەیە رەنگەکەی زەردی مەیلەو قاوەییە، بەردێکی بەنرخە. |
| سكالوب، اسقلوب | Scallope | (سکاڵۆپ)، جۆرە لەبکەیەکە، گیاندارێکی نەرمی لەپکەدارە، لەپکەکەی لە باوەشێن دەچێت، گۆشتەکەی دەخورێت. |
| سكانديوم | Scandium | (سکاندیوم)، توخمێکی کیمیاییە کێشی ئەتۆمییەکەی (٤٥) و ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٢١) کانزایەکە ناوەکەی لە وشەی (ئەسکەندناڤیا) وەرگیراوە نیشانەکەی (Sc). |
| سَكب | To pour | رۆکردن، رشتن، رژاندن. |
| سَكَب، سكبة | Anemone | گوڵاڵە، گوڵە نیسان. |
| سكبينج، خلباني | Galbanum | بەرزەد، زەمقێکی رێسینییە لە جۆرە درەختێك دەردەهێنرێت لە پزیشکیدا بۆ دەرمانی کۆکە باشە. |
| سكبينج، حلتيت عجمي | Persian-fennel | شمڵیی عەجەمی، جۆرە رووەکێکە. |
| سكبينة | Sagapenum | (ساگاپینەم)، جۆرە رێسینێکی بۆگەنە. |
| سكة | Road, Way | کوڵانی بەر بەرەڵا. |
| سكة | Way | رێگە. |

| | | |
|---|---|---|
| سكة | Coins | پـارە، دراو، ئاسـنێكی نەخشـاوە پـول و پـارەی لەسـەر لێدەدرێـت و دەردەهێنرێت. |
| سكة، مقطع | Ploughshare | بەشێکە لە گاسن لە پشت چەقۆکەوە گلەکە بە شێوەیەکی ئاسۆیی دەبڕێت. |
| سكة الحديد | Railway | هێڵی ئاسنین، (ئاسنە ڕێ). |
| سكتة | Apoplexy, Apilepsia, Stroke | لەکار کەوتنی ئەندامی لەش. |
| سكتة قلبية | Cardiac-arrest | پەرکەم، دڵ وەستان، خورپە، مەرگی کتوپڕ. |
| سكتة مخية، سكتة دماغية | Shock, Stroke, Cerebral Apoplexy, Apoplectic-stroke | تاسانی مێشك، نـزول، بریتی‌یـە لـە نەخۆشـی‌یەکی کتوپـڕ بـەهۆی تـەقین یاخود گیرانی بۆریی خوێن لە مێشکدا، نەخۆشەکە دەبوورێتـەوە و هێزی نامێنـێ بـەهۆی ڕەق بوونـەوەی بۆریـی خوێنبـەر و پاڵپەسـتۆی خوێنـی زۆرەوە فـەرەنگی و قەڵـەوی، ئـەو کەسـە پـەکی دەکـەوێت و لـە جووڵـە دەکەوێت و بێهۆش دەبێت و بە شێوەیەکی گشتی لە هەر ماندووبوونێکی زۆر کە پاڵەپەستۆی خوێن زیاد بکات. |
| سكة التبانة، درب التبانة، درب الحليب | Milky way | کاکێشان، پەڵە ئەستێرەیەکی وردە وەکوو ڕێگەیەك لە ئاسماندا دەبینرێت. |
| سُكْر، ثمل | Drunkenness, Acute Alcoholism | مەستیی، سەرخۆشیی، خوماریی، مەڵەنگیی. |
| سُكّر | Sugar, Saccharum sacch aride | شەکر، ئاوێتەیەکی ئـەندامی سـپیی شـیرینە، لـە کـاربۆن و هـایدرۆجین و ئۆکسجین پێکهاتووە بۆ خواردن و گەلێك مەبەستی تر بەکار دەهێنرێت. لە قامیشی شەکر و چەوەندەر دەردەهێنرێت. |
| سكر العنب، غلوكوز، سكر العسل | Glucose, Grape sugar, Honey sugar | شـەکری (گلوکـوز)، شـەکرێکی تـاکی مەیلـەو زەردە لـە تـرێ و خورمـا دەردەهێنرێت و دەدرێت بە منداڵ. |
| سكر الصمغ، عربينوز | Arabinose, Gumsugar | عەرەبینۆز، شەکری زەمق. |
| سكر القصب، سكروز | Cane sugar, Sucrose | شەکری قامیش، شەکری سوکەرۆز، شەکرێکی دوانییە، ڕەنگی سپییە بۆ خواردن و دروستکردنی شیرینی بەکاردێت. |
| سكر البنجر، سكر الشوندر | Beet sugar, Dextrose | شەکری چەوەندەر. |
| سكر ناعم | Castor sugar, Powdered sugar | شەکری وردە. |
| سكر نبات، قندة، طبرزد، ابلوج | Sugar-candy, Rock-candy | نـەبات، شـەکری میوە، قەنـە، پارچـە شـەکرێکە لـە شـلکردنەوەی شـەکری قامیش دروست دەکرێت. |
| سكر المَن، ترنجبين | Mannite, Mannose | شەکری گەزۆ. |
| سكري | Saccharine, Sugary | شەکریی، شەکرە، شتێك پەیوەندی بە شەکرەوە هەبێت. |
| سكر الفواكة | Fructos, Levulose, Fruit sugar | (فرکتۆز)، شەکری میوە، شەکرێکی تاکییە. |
| سكر الشعير | Maltose | (ماڵتۆز)، شەکری جۆ. |
| سكر الحليب، سكر اللبن | Lactose, Sugar of milk, Galactose | (لاکتـۆز)، (گالاکتۆز)، شـەکری شیر، مادەیـەکی کریسـتاڵ و شـیرینە لـەناو شیردا هەیە. |
| سكر النشأ | Starch sugar, Dextrin | شەکری نیشاستە، (دێکسترین). |
| سكر الرصاص، خلات الرصاص | Sugar of lead, Lead acetate | (لیدئەستیەت)، شـەکری قوڕقوشم، سرکەی قوڕقوشم، مادەیـەکی شـیرینی ژەهرینە. |

| | | |
|---|---|---|
| سكر القيقب، سكر الأسفندان | Maple-sugar | شەكری کەوتە، جۆرێکە لە شەکر لە ئاووکی داری کەوت دەردەهێنرێت. |
| سكر خام، سكر أحمر | Brown sugar | شەكری بۆر، شەکری هەڕەمە، شەکری خاو. |
| سكر محروق، كارامل | Burnt-sugar, Caramel | شەکری سووتاو، شلەیەکی خەستی قاوەیی‌یە لە گەرمکردنی شەکر یان هەر مادەیەکی کاربۆهێدراتی پەیدا دەبێت، پاشان ئاوی تێدەکرێت و دەپاڵێورێت و بۆ رەنگکردن بەکاردێت، بە تایبەتی رەنگکردنی ویسکی. |
| سكر (رؤوس) | Loaf sugar, (Coneshape) | کەللەشەکر، قەند. |
| سكر مكنة، سكر قطع | Lump sugar (Incubes) | شەکری خشتەکی، شەکری کلۆ، شەکری موکەعەب. |
| سكر محبب | Granulated sugar | شەکری بلووری، شەکری دەنك. |
| سكر بسيط | Simple sugar | شەکری سادە، شەکری ساکار، شەکری تاکیی وەکوو شەکری کلوکۆز. |
| سكرية | Sugar-basin | شەکردان، دەفرێکە شەکری تێدەکرێت. |
| سكروز | | بڕوانە (سكر القصب). |
| سكر الدم | Blood sugar | شەکری خوێن. |
| سكرية الدم | Glycemia | (گلیسیمیا)، بوونی شەکری کلوکۆز لە خوێندا. |
| سُكّري، مرض السكر، بول سكري | Diabetes-Mellitus | نەخۆشیی شەکر، شەکرە، نەخۆشی‌یەکە لە ئەنجامی کەمەردانی هۆرمۆنی ئەنسۆلینەوە، میز زۆر دەبێت و بڕی شەکری کلوکۆز لە خوێن و میزدا زیاد دەکات، ئەو کەسە زوو زوو تینوو و برسی دەبێت و کێشی کەم دەکات. |
| سُكرين، سكر الفحم الحجري | Saccharin, Saccharine | (سوکەرین)، رۆحی شەکر، مادەیەکی سپی‌یە دەکرێتە چایی‌یەوە لە قەترانی خەڵوز دەردەهێنرێت، لە لایەن ئەو کەسانەوە بەکاردەهێنرێت کە تووشی نەخۆشیی شەکر دەبن، (٣٠٠) جار لە شەکری قامیش یان چەوەندەر شیرینترە و ئەو زیانەش ناگەیەنێت بە نەخۆشەکە. |
| سكران | Drunkard | سەرخۆش، مەست، خومار، کەیل. |
| سكر احادي | Monosaccharide | شەکری تاکی وەکوو شەکری کلوکۆز، یەك گەردیلە کاربۆنی تێدایە. |
| سكر ثنائي | Disaccharide | شەکری دووانە وەکوو شەکری قامیش، دوو گەردیلە کاربۆنی تێدایە. |
| سكريات ثلاثية | Trioses | شەکری سیانی، سێ گەردیلە کاربۆنی تێدایە. |
| سكريات رباعية | Tetroses | شەکری چواری، شەکری چوارە، چوار گەردیلە کاربۆنی تێدایە. |
| سكريات خماسية | Pentoses | شەکری پێنجی، پێنج گەردیلە کاربۆنی تێدایە. |
| سكريات سداسية | Hexoses | شەکری شەشی، شەش گەردیلە کاربۆنی تێدایە |
| سكر سباعي | Hep tose | شەکری حەوتی، حەوت گەردیلە کاربۆنی تێدایە. |
| سكريات متعددة، سكريات مضاعفة | Polysaccharides | فرەشەکرە، شەکری چەندانە، ئەو کاربۆهیدراتەیە کە دەشێت بە ڕێگەی شیکردنەوەی ئاویی بکرێت بە چەند شەکرێکی تاکیی (وەکوو نیشاستەو سیلیلۆز). |
| سكر احمر جاوي، جكر | Jagger, Jaggery | شەکری جاوی، شەکرێکی مەیلەو قاوەیی‌یە بە باشی پاك نەکراوەتەوە لە شیلەی دارخورما دروست دەکرێت. |
| سكران، سيكران، بنج أسود | Black hen, Bane, Hogbeam, Hyoscyamus | بەنگی رەش، بەنگە کێویلە، رووەکی سەرخۆش، چاوی قەلەڕەشکە، تووتڕکی گورگ، رووەکێکی ژەهرینە دەرمانێکی رشێنەرەوە و بێهۆشکەری لێ دەردەهێنرێت. |
| سُكران | Scopolia | (سکۆپۆلیا)، گیایەکە لە کۆمەڵەی باینجان، قەدی ژێر زەویی هەیە گوڵەکەی شۆڕە، بەنجی لێ دەردەهێنرێت. |
| سكروبل | Scruple | (سکروپل)، یەکەیەکی کێشە دەکاتە (٢٠) دەنك گەنم، ١,٣گرام. |

| | | |
|---|---|---|
| سكر، ناظم مائي | Water-gate, Sluicegate | دەرگای بەندی ئاو. |
| سُكرة | Door bolt | کلیل و کلۆمی تەختە. |
| سُكرَة الموت | Agony, Deathpang | گیانەلا، ئاوزینگ، سەرەمەرگ، گیاندان، ئاویلکەدان. |
| سكرتير، امين السر | Secretary | سکرتێر، سەرنووسەر، نهێنیگر. |
| سكرتارية | Secreatariat | سکرتێرگە. |
| سكراب | Scrap | (سکراپ)، وردەو پارچە شتی کۆنە بەتایبەتی لە ئاسن و کانزاکانی تر. |
| سكراز، انفرتاز | Sucrase, Invertase | (ئینڤێرتاز)، هەوێنێکە شەکری سوکەرۆز دەگۆڕێت بۆ گلوکۆز و لیفیلۆز. |
| سكسية | | بڕوانە (ساکسوفون). |
| سكسة، طروغلودس، نمنمة، سكسوكة، دعويقة، صفراغون، صعو | Wren | فیرنەگولە، فیسقەگولە، باڵندەیەکە هێلانەکەی وەك گومەز وایە لە ئاوەوە بە پەر داپۆشراوە. |
| سكسولوجيا، علم الجنس | Sexology | زانیاریی رەگەزیی، رەگەز زانی (نێرومێ). |
| سكسوكة، عثنون | Goatee | کەبشتە، ریشێکی بچووك بە چەناگەوە. |
| سكسيكولا، قليعي | Saxicola | ئەبلەق، چۆلەکەیەکە لەناو بەردەڵانیدا دەژی. |
| سكسار، رباح | Talapoin, Baboon | سەگسەر، سەگسار، سەگە مەیموون، جۆرە مەیموونێکی تیسکنە، رەنگەکەی سەوزی مەیلەو زەردە. |
| سكسنيت، كهرمان | Succinite | کارەبا، رێسینێکی بوو بەردە. واتە جۆرێکە لە مادەی رێسین بووە بە بەرد، دەکرێت بە تەزبیح. |
| سكع، بخور مريم، خبز المشايخ. سكوكع | Cyclamen, Sowbread | بخوردی مەریەم، گیایەکی سەلکدارە بەرەکەی خرە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| سكعكع، ذُعرة، ابو فصادة | Wagtail | شوان خەڵەتێنە، کلك هەڵسەنگێنە. باڵندەیەکی بچووکە، تا زەلام زۆر لێی نزیك نەبێتەوە، نافڕێت. |
| سكفة (الباب) | Threshold | بەر دەرگا. |
| سكك، سمع | Microtia | گوێ بچووکی، کەسێك گوێچکەی بچووك بێت. |
| سكلاري | Scalare | (سکالاری)، جۆرە ماسییەکە. |
| سكن، سكني | Dwelling | خانوو، ماڵ، نیشتەنی. |
| سكنجبين | Oxymel | ئەسکەنجەبین، ئەسکەنجەبیل، تێکەڵەی سرکە و هەنگوین یان سرکە و شەکر، شەربەتێکی خۆشە. |
| سكهورن، سكتوبة | Saxhorn, Saxtuba | (ساکسهۆرن)، ئامرازێکی مۆسیقایە. |
| سكوت | Silence, Inactivity | بێدەنگیی، کڕیی. |
| سكون، هدوء | Calm, Quietude, Diapause | ئارامگرتن، داسەکنان، هێمنیی، بێدەنگی، کپیی، سرەوت، ئارام، وەستان. |
| سكوريا | Scoria | (سکۆریا)، بەردێکی بورکانیی شووشەیی سووکە چونکە بۆشایی تێدایە. |
| سكورديون، سقورديون، ثوم بري | Scordium | شێرەمارانە، سیرەکێویلە، گیایەکە لە سیری ئاسایی بچوکترە. |
| سكوته | | بڕوانە (سقوطة). |
| سكوتين | | برشوانە (سقوطين). |
| سكوته، دراجة الرجل | Scooter | (پاسکیل)، پایسکلی منداڵان. |
| سكوليت، كراشة | Bark beetle, Shot borer | قالۆنچەیەکی زیانبەخشە بە توێکڵی درەخت. |
| سكوليست | Scolecit | (سکۆلیسیت)، بەردێکی کانزاییە، بریتییە لە سیلیکاتی ئەلەمنیۆمی کالیسیۆمی ئاویی بە شێوەی کۆمەڵە بلوور. |

| | | |
|---|---|---|
| سكوبوفيليا، غلمة الرؤية، تلذذ المشاهدة | Scopophilia | (سكۆبوفیلیا)، ئالۆش سەیرکردن، هەستکردن بەئارەزووی رەگەزی لەکاتی تەماشاکردنی یەکێکدا کە لەشی بەدەرەوە بێت، حەزکردن بە بینینی لەش و وێنەی رووت. |
| سكوراكس | Scorax | (سکوراکس)، زەمقی داری زەیتوون. |
| سكونة | Schooner | (سکونەر)، کەشتیی چارۆکەدار. |
| سكورزونيرا، خسّ الكلاب، سلسفي أسود | Scorzonera | کاهووە سەگانە، جۆرە سەوزەیەکە کە لە هەڵەکۆك دەچێت، تامەکەی خۆشە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیی شەکر باشە، چونکە هۆرمۆنی ئەنسۆلینی تێدایە. |
| سكوروديت | Scorodite | (سکۆرۆدیت)، کەرەسەیەکی خاوە زەرنیخاتی ئاسنی ئاویی تێدایە، رەنگەکەی سەوزی کاڵ یان قاوەیی یان بێ رەنگە. |
| سكير | Drunkard, Hard-drinker, Toper | کەسێك کە بەردەوام مەی زۆر بخواتەوە. |
| سكّين | Knife | کێرد، کارد، تیخ، چەقۆ. |
| سكينة الاسكافي | Shoemaker knife | زەمبەلە، گەزەن. |
| سكينة قشر | Paring knife | چەقۆی پاککردن. |
| سكينة البيطار | Hoof knife | سم تاش. |
| سكينة الحلاقة | Shaving-knife | چەقۆی سەرتاشین، کافرمان، گوێزان. |
| سكينة المقاطع | Sectioning-Razor | چەقۆی برگە دروستکردن. |
| سكين القلم | Small knife | قەڵەمبڕ، کێرك، چەقۆیەکی بچووکە. |
| سكين ذو غمد | Bowie knife | کالانی، چەقۆی کالاندار. |
| سكينة المحراث | Coulter, Colter | چەقۆی گاسن. |
| سكين التشريط، مشراط | Scarificator | نەشتەر. |
| سكينة الجيب، مدية الجيب | Clasp knife | چەقۆی گیرفان، چەقۆیەکە دەنوشتێتەوە. |
| سكينة التطعيم | Grafting-knife, Budding knife | چەقۆی موتوربەکردن. |
| سكية، سوس الجبن | Tyroglyphus, Cheesemite | مۆرانەی پەنیر، سنی پەنیر، جۆرە مێروویەکی مەیلەو سپی‌یە، لمۆزەکەی کونکەر و مژۆکە. |
| سكيت، قرس | Gnats, Small midges | مێشوولەیەکی بچووکە. |
| سكيت | Black fly | مێشوولەی رەش. |
| سكيوم، شيوط، كوسى افرنجي، خيار افرنجي | Sechium | (سیکیوم)، رووەکێکی کشتوکاڵی‌یە لە کۆمەڵەی کوولەکە، رەگەکەی سەلکدارە گولچەکەی زەردە بەرەکەی گەورە و هێلکەیی‌یە، بە کوڵاوی دەخورێت. |
| سكينة | Calmness, Stillness | ئارامگرتن، هێمنی. |
| سكيلا | Scilla | (سکیلا)، جۆرە گوڵێکە. |
| سُلافة | Bestwine, Choicet | شەرابی نایاب. |
| سلالة، أصل النسب | Genealogy | تایەفە، رەگەز. |
| سلاح | Arm, Weapon | چەك، چەکی جەنگ. |
| سلاح ناري | Fire arm | چەکی ئاگرین، گوللەخۆر، گوللەهاوێژ. |
| سلاء، سمنة | Cooking butter | رۆنی قاڵکراو، رۆنی داخکراو. |

| | | |
|---|---|---|
| سوسة الحبوب | Corn-weevil, Corn-moth, Alucita | كيسەڵی گەنم، سنی دەغڵودان. |
| سوس الخشب | Death watch beetle, Anobuim | مۆرانەی تەختە. |
| سوس الفراء | Ptinus, Prind | مۆرانەی فەروە. |
| سوس الفول | Bean weevil | مۆرانەی پاقلە. |
| سوسة الجزر | Carrot weevil | مۆرانەی گێزەر. |
| سُوس ، عرقسوس، شجرة السوس، ريكليس | Liquorice, Sweet wood, Licorice | بەڵەك، مێكوك، رووەكێكی قنجی كێوی تەمەن درێژە، قەدەكەی رەقە، نزیكەی مەتر و نیوێك بەرز دەبێتەوە، قەد و گەڵاكانی هەمیشە شیلەیەكی لینجی پێوەیە گوڵەكەی سپی یان بنەوشەیی یان مەیلەو شینە، ڕەگەكەی درێژە و زۆر دەچێت بەناخی زەویدا و شیرینە، هاراوەی یان دۆشاوی رەگەكەی بۆ مەبەستی پزیشكی بۆ بەهێزكردنی سنگ و جگەر یان بۆ دروستكردنی شەربەتی بەڵەك و پیپسی كۆلا بەكاردێت. |
| سوسب | Schizanthus | (سچیزانثە)، گیایەكە گوڵی گەورەی جوان دەگرێت بە رەنگی سپی یان پەمبەیی یان زەرد یان پرتەقاڵی. |
| سوسل | Schizandra | (سچیزاندرا)، دەوەنێكی كەپرییە بۆ ڕازاندنەوە، گوڵەكەی بە شێوەی هێشوویەكی شۆڕی سوورە بەرەكەی لە ترێ دەچێت، سوورە دەخورێت. |
| سوسليق | | بڕوانە (سصلق). |
| سَوْسَن، رفيف | Iris, Orris-root Paint, Pale flag | سەوسەن، سوێسنە، كاری، پەلێزە، رووەكێكی پیازییە و گەڵاكانی درێژ و باریكن، گوڵی هەمەڕەنگەی گەورەی جوان دەگرێت، بنەوشەیی، سپی، زەرد، لە باخچەكاندا دەڕوێنرێت بۆ جوانی، قەدی ژێر زەوی هەیە و هەندێ جۆریشی كێویلەیە. |
| سوسن ايرساء، اسمانجوني، سوسن ابيض، سوسن فلورسنة، دهق | Florentine-iris | سوێسنەی سپی، گوڵەكەی سپییە . |
| سوط | Flagellum, Whip, lash | قەمچی، قامچی، تاژانك، شەلاخ، قامیشێكی هۆنراوەیە سوارەكان بۆ لێخوڕینی وڵاخ بەكاری دەهێنن. |
| سَوْطيات | Flagellates, Mastigophora | گیاندارە قامچیدارەكان، كۆمەڵە گیاندارێكی سەرەتایی یەكخانەی قامچیداری ئاوین وەكو یوگلینا. |
| سَوْطيات اصلية | Euflagella | قامچیدارە بنەڕەتیەكان . |
| سَوْطيات جذرية | Rhizoflagellata | قامچیدارە ڕەگدارەكان . |
| سَوْطيات مثانية | Cysoflagellates | قامچیدارە میزەڵانیەكان. |
| سَوْطيات مطوقة | Choanoflagella | قامچیدارە تەوقدارەكان . |
| سوغي | Cryptomeria | ( كریپتومیریا)، درەختێكە تەختەكەی سوورە، بەرەكەی خڕ و باڵدارە ، تەختەكەی بەنرخە. |
| سوق | Market | بازاڕ، بازێڕ. |
| سوق الخضر | Market-hall | بازاڕی سەوزە. |
| سوق المواشي | Cattle fair, Trailing, Cattle market | بازاڕی مەڕومالآت . |
| سوق راقدة، سوق راكدة | Dull market | بێبازاڕی، بازاڕكزی. |

| | | |
|---|---|---|
| سوق نشيطة | Brisk market | بازاڕی گەرم. |
| سوق سوداء | Black market | بازاڕی ڕەش، کڕین و فرۆشتن بە نرخێکی زیاتر لەوەی دەوڵەت دایناییێت. |
| سوقم، ابنوس كاذب | Laburnum, Base tree | ئەبەنۆسە درۆزنە، دار و دەوەنێکە لە بی دەچێت، گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویەکی بۆن خۆشی شۆڕە، بەرەکەی لە هەنجیر دەچێت شیرین و بۆن خۆشە. |
| سوقمية، قوباء | Sycosis | جۆرێکە لە نەخۆشی کەچەڵی . |
| سوك | Brushing, Cleaning the teeth | ئاژنین، ددان ئاژنین. |
| سوكت، وقب | Socket | ( سۆکێت)، سۆکتی کارەبا، ئامرازێکی کارەباییە هەردوو سەری پلاکی ئامرازی کارەبای پیا دەکرێت . |
| سول، صول | Sol | ( سۆل)، پەرتبوونەوەی گیراوەیەکی مڵ ( غروری) لە شلەیەکدا، گیراوەیەکی مڵە ، ڕەوشتی شلەی هەیە. |
| سولات كحولية | Alcoholic sols | سۆلە ئەلکحولییەکان . |
| سولات جاذبة لوسط الانتشار ، ليوفيلي | lyophilic | ( لایوفیلی)، سۆلە ناوەندی بلاوبوونەوە وێستگەکان، ڕەوشتی ئەو مادەیە کە ئامادەیە بۆ چوونە ناو گیراوەی ملییەوە لە شلەیەکدا وەکو سرێش و جەلاتین . |
| سولات معلقة ، سولات نافرة لوس الانتشار، ليوفوبي | Lyophobic | ( لیوفۆبی)، سۆلە گیراوەکان یان سۆڵە ناوەندی بلاوبوونەوە نەویستەکان، ڕەوشتی ئەو مادەیەی کە لە باری ملیدا دەمێنێتەوە ، بەلام بەرهەڵستی شلەکان دەکات، وەکو گیراوەی ملی زێڕ و گۆگردیدی زەرنیق. |
| سولينودون | Solenodon | ( سۆلینودۆن)، گیانداریی مێرووخۆرە شێوەیەکی سەیری هەیە لە مشك دەچێت، لمۆزێکی درێژی هەیە لە کوبا و هایتی دەژی. |
| سولع، صبر سقطري | Aloes | ( ئەلۆی)، تالی شاری، جۆرێکە لە هەنجیری دڕکاوی واتە سوبێر، ئاوگێکی پزیشکی تال ( ئەلوێن) لە گەلاکەی دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت . |
| سولانين | Solanine | ( سۆلانین)، مادەیەکی نیمچە ئەلکالییە، ژەهرین و تاڵە . |
| سولانو | Solano | ( سۆلانۆ)، بایەکی ڕۆژهەلاتی باراناوییە . |
| سول هوائي | Aerosol | ( ئیروسۆل)، تەم ، مژ، تەپ، تۆز. |
| سوم | Bargaining | سەوا، سەواکردن، مامڵە. |
| سوماتوبلازم | Somatoplasm | ( سۆماتۆپلازم)، ئەو خانانەی کە لەشی زیندەوەریان لێپێکهاتووە جگە لە خانە ڕەگەزییەکان . |
| سونة | Eurggaster, Euryaster-intrgriceps | ( یوریگاستەر)، سون، سنك، کیسەڵە، ئەسپێی گەنم، مێروویەکی زیان بەخشە لەسەر دەغڵودان دەژی، ڕەنگەکەی زەرد یان بۆرە ، لەشەکەی پەڵەی ڕەش یان هێڵی ڕەشی تیایە . |
| سوني | Sunl | ( سونی)، جۆرێکە لە مانگاکێوی. |
| سوناتة | Sonata | ( سۆناتە)، ئاوازێکی موسیقایە بە ئامرازێکی تەنهایی وەکو پیانۆ یان بە دوو ئامرازی وەکو پیانۆ و کەمانچە لێدەدرێت. |
| سونار | Sonar | ( سۆنار)، دەزگایەکە لە ڕادار دەچێت، بەلام لە جیاتی شەپۆلی بێتەل، شەپۆلی دەنگ بەکاردەهێنێت بۆ دۆزینەوەی تەنی نزیك بە کەشتی یان بۆ دۆزینەوەی قووڵایی و شتومەکی ژێر ئاو بەکاردەهێنێت . |
| سونيتة | Sonnet | ( سۆنێت)، پارچە شیعرێك لە (١٤) دێڕ پێکهاتبێت . |

| | | |
|---|---|---|
| سوي، اعتيادي | Normal, Ortho- | ئاسايي. |
| سويداء | Endosperm | ( ئيندوسپێرم)، تێشوو، سپێرمی ناوەوە، ئەو بەشەیە کەوا نیشاستەی تیادا کۆدەبێتەوە لە دەنکی دەغڵوداندا (دانەوێڵە). |
| سوید، نبق فلسطیني، عجرم | Palestinian-buckthorn | تاوگی فەلەستینی، جۆرێکە لە درەختی تاوگ لە سوریە و فەلەستین دەروێت . |
| سويدة، صدا الحبوب | Rust | ( ژەنگ)، ژەنگی ڕووەکی، نەخۆشی‌یەکی ڕووەکی‌یە تووشی گەنم و جۆ دەبێت ، زیپکەی زەردی مەیلە و سوور لەسەر قەد و گەڵاکانی پەیدا دەکات، دەبێتە هۆی پووکانەوە و پڕنەبوونی گەنم یان جۆکە. |
| سويدة، دلوق | African-salsola, Shruby sea blite | ( سالسۆلای ئەفریقی)، گیایەکی دەشتەکی‌یە گوڵەکەی سەوزە، سۆدەی لێدەردەهێنرێت. |
| سويج، زر کهربائي ، مفتاح کهربائي | Switch | ( سویچ)، ئەو دوگمەیەیە کە کارەبای پێدادەگیرسێنرێت یان پی‌ی دەکوژێنرێتەوە . |
| سويداء الظل | Umbra | ( ئەمبرا)، سێبەری تەواو، ناوجەرگەی سێبەر . |
| سويق | Petiole, Stalk | لاسکۆکە، لاسك، قەدۆکە، قنچك، چنچك. |
| سويق، عجز، قصرة | Tigella | لاسکۆکەی کۆرپەلە. |
| سويق | Fine flour | ئارد وەکو ئاردی قەرەخەرمان . |
| سويق تحت الفلق، سويق سفلي | Hyposotyl | لاسکۆکەی ژێر لەتکە، بەشێکە لە چەکەرەی تۆو،دەکەوێتە نێوانی ڕەگۆکە و لەتکەکانەوە. |
| سويق فوق الفلق، سويق علوي | Epicotyl | لاسکۆکەی سەر لەتکە، بەشێکە لە چەکەرەی تۆو،دەکەوێتە سەروو لەتکەوە. |
| سويكتة سكيت، قرقس | Phlebotome | ( فلیبۆتۆم)، جۆرە مێوولەیەکی بچووکە. |
| سيء، رديء | Bad, Evil | خراپ، بەد. |
| سياقة، سوق | Driving | لێخوڕین، ئاژووتن، سەرکاری . |
| سياج جداري | | شوورە. |
| سياج ، وشيع | Hedge | پەرژین، تیمان، چەم ئاخورە . |
| سياج من اغصان | Fence | چەپەر، تانور. |
| سياج من القصب | Hedge of reed | چیخ. |
| سياج واقي | Preservative, Hedge-Fence(or), Wall(or) Railing | شوورەی پارێزەر، یان پاراستن، هۆیەکە بۆ پاراستنی ئەو کەسانەی کە لەبەکارهێنانی تیشکدا ئیش دەکەن، وەك بەکارهێنانی تیشکی ئێکس و مادەی تیشکدەرەوە و تەنووری ئەتۆمی، بۆ نموونە ئەوانەی کە تیشکی ئەلفا بەکار دەهێنن کلاوێکی قوڕقوشمی بەکاردەهێنن و شوورەیەکی کۆنکرێتی دروست دەکەن بە دەورو پشتی تەنووری ئەتۆمیدا دژی ئەو تیشکە زیانبەخشانەی لە تەنوورەکە دێنە دەرەوە. |
| سيانوجين | Cyanogen | (سیانۆجین)، گازێکی ژەهرینی بێ‌ ڕەنگە زوو گڕ دەگرێت، بۆنی بادەمی تاڵی لێدێت، لە جەنگدا بەکاردێت، لە کاربۆن و نایترۆجین پێکهاتووە. |
| سيانيد | Cyanide | (سیانید)، ڕەگی ترش، هایدرۆسیانیك وەکو فیریسیانید. |
| سيانيد المثيل | Methyl cyanide | سیانیدی مەثیل، شلەیەکی بێڕەنگە لە پیشەسازیدا بەکاردێت. |
| سيانيد الاثيل | Ethyl cyanide | سیانیدی ئەتیل، شلەیەکی بێڕەنگە، بەشێوەی توێنەرەوە بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| سيانين | Cyanine | (سيانين)، بۆیەیەکە وا لە فلیمی فۆتۆگرافی دەکات کەهەستیار بێت بۆ ڕووناکی. |
| سيانين | Cyanin | (سيانين)، ڕەنگێکی شینە لەگوڵدا هەیە. |
| سيانيد البوتاسيوم الحديدوزي، فيروسيانيد | Potassium Ferrocyanide | (پۆتاسیۆم فیرۆسیانید)، فیرۆسیانیدی پۆتاسیۆم، مادەیەکی زەردە لە دروستکردنی بۆیەدا بەکاردێت. |
| سيانيد البوتاسيوم الحديدكي ، فيريسيانيد البوتاسيوم | Potassium Ferricyanide | (پۆتاسیۆم فیرۆسیانید)، فیریسیانیدی پۆتاسیۆم، مادەیەکی سووری بریسکەدارە لە دروستکردنی بۆیەدا بەکاردێت. |
| سيانيد الحديديك الحديدوزي، زرقة بروسيا | Ferric Ferrocyanide | (فیریك فیرۆسیانید)، شینی پرۆسیا، بۆیەیەکی شینە. |
| سیانامید | Cyanamide | ڕەنگێکی کیمیاییە یەك ئەتۆم کاربۆن و دوو ئەتۆم هایدرۆجین و دوو ئەتۆم نایترۆجینی تیایە. |
| سیانامید الكالسيوم | Calcium-cyanamide | (کالسیۆم سیانامید)، جۆرە پەینێکی کیمیاییە، کالسیۆم و کاربۆن و نایترۆجینی تیایە، بۆنی سیری لێ دێت. |
| سيانات | Cyanate | (سیانەیت)، ترشی سیانیك، کاربۆن و نایترۆجین و ئۆکسجینی تیادایە. |
| سيانيت | Syenite | (سیانیت)، بەردێکی ئاگرینە، بەزۆری لە (فیلدسپار) پێکهاتووە. |
| سيار | Moving | گەڕۆك، گەڕیدە. |
| سيارة | Motor car, Automobile | ئۆتۆمبێل. |
| سيارة عامة، حافلة، اوتوبيس | Autobus | پاس، ئۆتۆمبێلی گشتی، ئۆتۆمبێلێکی گەورەیە بۆ گواستنەوەی ڕێبوار بەکاردێت. |
| سيارة مجلجلة | Sound truck | ئۆتۆمبێلێك کە میکرۆفۆنی تیادابێت. |
| سيارة ستايشن | Station wagon | ئۆتۆمبێلی ستیشن، ئۆتۆمبێلێکی گەورەیە ڕیزێك کورسی تێدایە بۆ دانیشتن. |
| سيارة الأطفاء | Fire engine | ئوتومبیلی ئاگرکوژاندنەوە. |
| سيارة مصفحة | Armoredcar | ئوتومبیلی زرێدار. |
| سيارة (سيارات) | Planet | ئەستێرە گەڕۆکەکان، ئەستێرە گەڕیدەکان. |
| سيارات خارجية، سيارات علوية | Exterior planets | ئەستێرە گەڕۆکە دەرەکییەکان، ئەو ئەستێرە گەڕۆکانەی کە خولگەکانیان کەوتوونەتە دەرەوەی خولگەی زەوی . |
| سيارات عليا | Superior planets | ئەستێرە گەڕۆکە ژووروەکان . |
| سيارات سفلى | Inferior planets | ئەستێرە گەڕۆکە خوارووەکان . |
| سيادة، تغلب | Dominance, Perdominance, Supremacy Ascendany | زاڵ بوون، وەکو لە زانستی کیمیادا . |
| سيادة تامة | Compete-dominance | زاڵبوونی تەواو . |
| سيادة ناقصة | Incomplete-dominance | زاڵبوونی ناتەواو . |
| سيارة رياضية | Sports car | ئوتومبیلی وەرزش، ئوتومبیلێکی سەر بەرەڵای نزمی خێرایە دوو کورسی تیادایە . |
| سيارة أسعاف | Ambulance | ئوتومبیلی فریاکەوتن، ئامراز و دەرمانی پزیشکی تێدایە . |
| سيارة صهريج، شاحنة | Trailer-tank | ئوتومبیلی نەوت گوێزەرەوە . |
| سيارة لاسلكية | | ئوتومبیلی بێتەل، جۆرە ئوتومبیلێکە دەزگای بێتەلی تیادایە . |

| | | |
|---|---|---|
| سيارة نقل (لوري) | Lorry | لۆری، ئوتومبیلی بارگواستنەوە. |
| سيانوطس | Blue tea bush, Redroot tree, Ceanothus | دەوەنی چایی شین، دەوەنی ڕەگ سوور، دەوەنێکە گوڵی سپی دەگرێت و ڕەگەکەی مادەی پزیشکی لێ دەردەهێنرێت . |
| سياحة | Tour, journey, travel | جهانگەڕی، گەشتکردن، گەشت، گەڕیدەیی. |
| سيّاح، سوّاح | Tourist, traveller | جهانگەڕ، گەڕیدە، گەڕۆك. |
| سَيّاف، سوسن المناقع | Yellow iris, Yellow water-flag | سوێسنەی زۆنگاو، سوێسنەی زەرد، گوڵی زەرد دەگرێت . |
| سَيّاف | Swordman | شیردار، شیروەشێن، ئەوانەی شیر بەکاردەهێنن. |
| سَيّاف البحر، ابو سيف | Swordfish | شیرماسی، شمشێرماسی، ماسی‌یەکی گەورەی دەریایی درندەیە ، شەویلکەی سەرەوەی وەك شیر باریك و درێژە، هەندێك جار درێژی لەشی ئەم ماسی‌یە دەگاتە پێنج مەتر. |
| سيامان، جبون سيامان | Siamang, Syndactyius | ( سیامانگ)، جۆرێکە لە مەیمونی جیبۆن زۆر گەورەیە ، ڕەنگەکەی ڕەشە لە دوورگەی ماڵتا دەژی. |
| سَيّاب، بلح | Unmature-dates | فەریکە خورما. |
| سَيّال، سيالة | | بڕوانە ( سنط دماع). |
| سيال | Sial | ١. ( سیال)، بەردێکی ئاگرین یان گرانیتییە، مادەی سلیکۆنی ئەلەمنیۆمی تیادایە .<br>٢. ( سیال)، چینی دەرەوەی توێکڵی زەوی ، سلیکا و ئەلومینای زۆر تیادایە. |
| سيالة، سيلة | Runlet, Water course | جۆگە. |
| سَيّال | Fluid | مادەیەکی زۆر شل . |
| سياع، بان، يسر، شوع، فجل الحصان | Ben oil tree, Horse radish | داری بان، توری ئەسپ، درەختێکە گەڵاکەی هێلکەیی و ئاوێتەیە گوڵەکەی بۆنخۆشە، بەرەکەی لەبەری فاسۆلیا و دەنکەکەی لە دەنکی نۆك دەچێت، ڕۆنێکی (زەمقێکی) ڕێسینی بۆنخۆشی لێ دەردەهێنرێت بۆ دروستکردنی عەتر بەکاردێت. |
| سياع | To plaster (a wall) with mud | سواخدان، هێلەساوکردن، گڵکاری، قوڕکاری، کەفماڵ، لەپماڵ. |
| سيب، عسبار | Aard-wolf | گورگاز، گیاندارێکە لە کەمتیار دەچێت، بەڵام بچووکتر و تیسکنترە لە ئەفریقا دەژی. |
| سيبيا، سبيدج، حبار | Sepia, Squid | (سیپیا)، جۆرە گیاندارێکی نەرمی ئاوییە لە هەشتپێ (خطبوط) دەچێت، دەخورێت. |
| سيبة | Step ladder | جۆرە پەیژەیەکە قەد دەکرێت و دەگوێزرێتەوە. |
| سيبة، شجرة القابوق | Ceiba, Kapok tree, Bombax | دارکاپۆك، ڕووەکێکی ناوچە گەرمەکانە تۆوەکەی ڕیشاڵی ئاوریشمی تیادایە. |
| سيبرنيات | Cybernetics | (سایبەرنێتیکس)، خوێندنی میکانیزمی دەست بەسەرگرتن و پەیوەندی لە ئامرازو گیانداردا وەکوو لە مرۆڤی ئامرازیی (الأنسان الآلي) و ئامرازی ژمارەدا. |
| سيبان، صئبان | Nit | ڕشك، گەرای ئەسپێ و کێچ. |
| سيتان، سيتين | Cetane | (سیتێن)، ڕۆنێکی بێڕەنگە لە پەترۆڵدا هەیە. |
| سيترال | Citral | (سیترال)، مادەیەکی ئەلدیهایدی ئاتێرە لە ڕۆنی لیمۆدا هەیە. |
| سيتاز | Cytase | (سایتێن)، ئەنزیمێکە مادەی سلیلۆزی دەکات بە شەکر لە تۆوە چەکەرە کردووەکاندا هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| سيتريس الزرع | Scythris | (سیتریس)، جۆرە پەپوولەیەکی زیانبەخشە بە رووەك. |
| سيتوبلازم | | بڕوانە (سایتۆپلازم). |
| سيتوان، سيتونية | Chafer, Cetonia | (چافەر)، جۆرە قالۆنچەیەکی ڕەنگینە ئاوکی گوڵ هەڵدەمژێت. |
| سيتونية مذهبة، خنفساء الورد المذهبة | Cetonia aurata, Goldsmith-beetle, Rosebettle, Rose chafer | قالۆنچە زێڕینە، قالۆنچەی گوڵەخی زێڕین. |
| سيتون | Sitona | (سیتۆنا)، مۆرانەیەکی زیانبەخشە بە رووەك. |
| سيجان | Siganus | (سیجان)، ماسی‌یەکی دەریاییە دەخورێت. |
| سيجارة | Cigarette | جگەرە. |
| سيح | Run off surface | بڕی ئە ئاوەی کەبەسەر رووبەرێکی تایبەتی لە زەویدا دەڕوات. |
| سيخ، سفود | Spit, Skewer | شیش، وەکوو شیشی کەباب. |
| سيخ الدراويش | Bar | زەرگ. |
| سيدة، ربة البيت | Lady | خانم، بانوو، خان، کابان، کەیوانۆ، کەیبانوو. |
| سيد | Chief, Head | سەروەر، کاك. |
| سيدا | Checker, Bloom, Greekmallow | (سیدا) تۆڵەکەی ئەغریقی، جۆرە گیایەکە لە کۆمەڵەی تۆڵەکە. |
| سيدر، خمر التفاح | Cider | (سیدەر)، شەرابی ئاوی سێو. |
| سيدرايت، سيدريت | Siderite, Chaly bite, feco3 | (سایدرایت)، بەردێکی نیکلی‌یە لەو ئەستێرە کشاوانەدا هەیە کە دەکەونە خوارەوە بۆ سەر زەوی، مادەی ئاسنی تێدایە. |
| سيدة الغدد، غدة نخامية | Pituitary gland, Master gland | لووی پیتویتەری، لوویەکە دەکەوێتە ژێر بنکی مێشکەوە، مادەی هەمەجۆرەی ئەوتۆ دەردەدات کە پێوەندی‌یان بە فرمانە سەرەکیەکانەوە هەیە. |
| سيد قشطة، فرس النهر، برنيق، بهيموت | Hippopotamus | (هیپۆپۆتاموس)، ماینی رووبار، ماینی ئـاویی، ئەسپی رووبـار، ئەسپی ئاویی، گیاندارێکی شیردەری کەتەی گیاخۆری ئاوییە، سەرو دەمی زۆر گەورەن، پێستەکەی ئەستوور و لاقەکانی کورتن، لە رووباری نیلدا زۆرە. |
| سيدة الأدغال | Bush master | خانمی دارستان، خانمی بێشەڵان، مارێکی زۆر کەتەو پیسە. |
| سيدوم، حيّ العالم | Stonecrop, Sedumacre | (سیدۆم)، جۆرە گیایەکە لە قەوزە دەچێت لەسەر بەرد و دیوار دەڕوێت. |
| سير | Belt | سیپ، قایش، وەکو قایشی سەعات و پشتێن. |
| سيراتايت | Ceratites | (سیراتایت)، جۆرێکە لە گیانەوەری بەبەرد بوو. |
| سير، حبل جلدي، سير جلدي للخياطة | Thong strop | سیرمە، زۆڵە چەرم، زوێڵ، دەوێڵ. |
| سير | Walking | رۆیشتن، پیاسەکردن. |
| سير أثناء النوم | Somnambulism, Noctambulism | رۆیشتن بەدەم خەوەوە، خەوڕەویی. |
| سيروزيت، سيروسيت | Cerussite | (سێرۆزیت)، مادەی کاربۆناتی قوڕقوشم، بەشێوەی بلووری بێرەنگی رۆشن هەیە. |
| سيراء، قطمير، غلاف باطن، غلاف داخلي | Secundine | بەرگی ئاوەکی، بەرگی ئاوەوەی گەرا یان تۆو. |
| سيريسين | Ceresin, Cerasin | (سیریسین)، مۆمی سیریسین، مادەیەکی مۆمی رەقی سپیە لە جیاتی مێوی هەنگوین لە دروست کردنی مەلحەم و بۆیەدا بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| سیریسیت | Sericite | (سیریسیت)، جۆرێکە لە میکای سپی. |
| سیریوم | Ceruim | (سیریۆم)، توخمێکی کیمیاییە نیشانەی (Ce)، کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (١٤٠) و ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٥٨) و کانزایەکی خۆڵەمێشی‌یە، ماناکەی لە وشەی (سیرس) واتە (ئەستێرەی خوداوەندی) وەرگیراوە نیشانەکەی (Ce). |
| سیرینا (خیلانیات) | Sirenian | (سیرینا)، کۆمەڵە گیاندارێکی دەریایی شیردەری گیاخۆرن، وەکوو مەری دەریا. |
| سیرسیم | | (سیریسیەم)، کەرتەشی گوڵ سەوز، جۆرێکە لە گیای کەرتەشی گوڵەکەی سەوزە و درکی زۆرە. |
| سیراتورسورس | Ceratosaurus | (سیراتۆسۆرەس)، گیاندارێکی قڕتێکەوتووە. |
| سیروس، سیریوس | Cereus, Hedgecautus, Torch-Thistle | (سیریۆس):<br>١. ڕووەکێکی بیابانیە، جۆرێکە لە هەنجیری درکاوی واتە سوبێر، ئاوێکی زۆری تێدایە.<br>٢. جۆرێکە لە ڕووەکی کەرتەشی. |
| سیرج، شیرج، دهن السمسم | Sesame-oil, Gingili-oil | ڕۆنی کونجی، شیرە. |
| سیرالیت | Sierralite | (سیرالیت)، سلیکاتی ئەلەمنیۆمی مەگنسیۆمی ئاویی، لە دروستکردنی سیرامیکدا بەکاردێت. |
| سیرفس | Syrphus | (سیرفەس)، جۆرە مێشێکی بچووکە. |
| سیراسیوم | | (سیراستیەم)، گیایەکە لە کۆمەڵەی مێخەك لقەکانی تووکنە گوڵەکەی سپی‌یە. |
| سیزیوم | Caesium | (سیزیۆم)، توخمێکی کیمیاییە نیشانەکەی (CS)، کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (١٣٣)، ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٥٥)ە کانزایەکی سپی زیوییە ماناکەی ووشەی (سیزیۆم) واتە: هێڵێکی شینی ئاسمانی شەبەنگی دەگرێتەوە. |
| سیزال، سیسیل، قنب سیسال | Sisal hemp | گوشی سیسال، جۆرێکە لە سوبێر، گەڵاکەی نزیکەی یەك دوو مەتر درێژ دەبێت، ڕیشاڵدارە بۆ مەبەستی پیشەسازی بەکاردێت، بەتایبەتی پەتی لێ دروست دەکرێت. |
| سیزالبنیات، عندمیات | Caesalpinea | (سیسالپینیا)، کۆمەڵە ڕووەکێکی پاقلەمەنی‌یە بەشێوەی دارو دەوەن و گیا و گوڵی هەمەڕەنگە دەگرێت، ڕەنگی زەرد و سووری لێ دەردەهێنرێت، بەرەکەی لە بەری پاقلە دەچێت. |
| سیزامیة | Sesamia | (سیزامیا)، مێرووەکە ڕەنگەکەی قاوەیی مەیلەو زەردە. |
| سیس، یاسمین | Jasmine | یاسەمەن، ڕووەکێکی تەمەن درێژی کەپرییە گوڵی سوور و سپی بۆنخۆش دەگرێت. |
| سیسمومتر | Seismometer | (سیسمۆمەتر)، ئامرازێکە بۆ پێوانی ماوە و هێز و ڕێڕەوی بومەلەرزە. |
| سیسبان، فاصولیالحصان | Sesban, Sestania, Danchiplant | سیسەبانی، ڕووەکی دانچی، جۆرێکی هەیە بەشێوەی درەختە، گەڵاکانی پانە، گوڵەکەی سپی و گەورەیە، دەنکەکەی لە دەنکی کونجی دەچێت، بۆ دەرکردنی بەردی میزەڵدان و زراو باشە، ئەم ڕووەکە لە شۆڕە بی دەچێت، گەڵاکەی وەکوو پەڕ وایە. |
| سیسم، شیشام | Shisham, Del bergia-sisso | بڕوانە (ساسب، سیسم). |
| سیسي، برنق | Pony, Mustang, Bronco | (پۆنی)، (برۆنکۆ)، جۆرە ئەسپێکی بچووك و جوان، لەناو ماڵدا بەخێو دەکرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| سيسموغراف، مرسام الزلازل | Seismograph | (سيسمۆگراف)، وێنه گری بوومەلەرزە، تۆمارکەری بوومەلەرزە. |
| سيساء، فقرة | Vertebra | بڕبڕە، یەك بڕبڕەی پشت. |
| سيساء، حاروك | Wither | ناوشانی ولاخ. |
| سيسارون | Skirret, Water parsnip | (سکێرێت)، گێزەری سپیی ئاویی، ڕووەکێکە گوڵەکەی وەکوو چەتر وایە سەلکەکەی وەکوو گێزەر یان هەڵەکوك وایە دەخورێت و دەکرێت بە چێشت. |
| سيسارون كبير، جزر ابيض، اسطفلين | Parsnip, Cow cakes | گێزەری سپی، ڕووەکێکی سەلکدارە گوڵەکەی زەردە، هەندێکی بۆ خواردن و هەندێکی بۆ ئالیك بەکاردێت. |
| سيسيليانت | Caeciliane | (سیسیلیان)، گیاندارێکی تەروشکییە پەلی نیە لە کرم دەچێت چاوی زۆر کزە، لەژێر زەویدا دەژی. |
| سيسالتانيا، ابو شوارب | Brasiletto, Cassaltania, Bird of paradise | ریشی پاشا، دەوەنێکی جوانە گەڵاکەی ئاوێتەیە وەکوو پەڕ وایە گوڵەکەی زەردە کاسەی گوڵەکەی درێژ و پەمبەییە بەرەکەی لە فاسۆلیا دەچێت. |
| سيسك، صفصفة | Saccostome | (ساکۆستۆم)، گیاندارێکی قرتێنەرە لە مشك دەچێت. |
| سيسم، انف العجل، انف الثور | Drago | لووتی گوێرەکە، گیایەکی ریشاڵییە گوڵی زەرد یان سپی یان سوور دەگرێت، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| سيسنبر، سعتر امرط، نمام الملك، زبيزبة، سعتر بري | Mother of thyme, Wild thyme, Creeping thyme | ١. سیس عومەر.<br>٢. جاترە کێویلە، جاترەی خشۆك، جۆرێکە لە گیای جاترە، گوڵەکەی پەمبەییە. |
| سيسنبريون، سمارة، فجل الجمال | Hedge mustand, Sisymbrium | خەرتەلەی پەرژین، توری ووشتر، گیایەکی پزیشکییە گوڵی زەرد دەگرێت. |
| سيسنديل، خنفساء برية | Cicindela, Tigerbeetle | قالۆنچەی بەوریی جۆرە قالۆنچەیەکە مێرووی تر دەخوات. |
| سيطرة | Control | دەسەڵات، دەست بەسەراگرتن، کۆنترۆڵ. |
| سيطرة الكترونية | Eletronic control | دەست بەسەراگرتنی ئەلەکترۆنی، کۆنترۆڵی ئەلەکترۆنی. |
| سيف | Sword, Sabne | شیر، شمشێر. |
| سيف المبارزة | Smallsword | شیری شەرە شیر، شیری شەڕ. |
| سِيف | Beach | لم و چەوی کەنار دەریا. |
| سَيْف | Cutlass fish, Hair tail | کلکەموو، جۆرە ماسییەکی دەریایی لاکێشەییە کلکی تیژ و درێژە لە شیر دەچێت. |
| سيف الجبار | Saif | شیری مەزن، ناوی ئەستێرەیەکە. |
| سيف الغراب، دلبوث | Corn-flag, Swordlily, Gladiolus | (گلادیۆلس)، شالانگ، شمشێری قەلەرەش، ڕووەکێکە لە زەعفەران دەچێت گەڵاکەی لە شمشێر دەچێت. |
| سيف الحصاد، مقضب | Scythe | جۆرە داسێکی گەورەیە دەسکێکی درێژی هەیە بۆ دوورینەوەی گیا. |
| سيفر | Severs | سیڤەر، جۆرێکی ئاپابە لە فەخفووریی فەرەنسی. |
| سيف الدراويش | Bar | زەرك، زەرگ. |
| سيفون، نجير | Sea wheat grass | گەنمی دەریا، گیایەکی دەشتەکییە کۆمەڵەی دەغڵودانە بۆ لەوەڕ باشە لەناو دەغڵودانەدا دەروێت. |
| سيفون، سحارة | Siphon | ( سیفۆن)، وشترگەروو، ئامرازێکە بۆ گواستنەوەی شلە لە بەرزییەوە بۆ نزمی. |

| | | |
|---|---|---|
| سيفونوفور، انبوبيات | Ciphonophore | ( سيفۆنۆفۆر)، گیاندارێكی ساكاری دەریاییە لەكۆمەڵەی هایدرا شێوەی لە بۆری دەچێت. |
| سيفون المجارير | Trap | سیفۆنی ئاودەست . |
| سيفونابتيرا، براغيث | Siphonaptera, Fleas | كێچەكان، پەلێكە لە مێرووی مشەخۆر. |
| سيفنة | Tragopan | ( تراگۆپان)، باڵندەیەكە لە كۆمەڵەی پۆر سەری نێرەكەی زیادە گۆشتی پێوەیە لە شاخ دەچێت . |
| سيفي الشكل | Ensiform | شێوەشیر، شتێك لە شێوەی شیردا بێت وەكو گەڵای ڕووەك. |
| سيفيات الذيل | Xiphosura | كلك شمشێرییەكان، جۆرێكە لە كۆمەڵەی گیانداره جومگەدارەكان وەكو شاقرژاڵ . |
| سيفي المنقار | Sword bill | دەنووك شمشێر، باڵندەیەكە لە باشووری ئەمریكادا دەژی دەنووكە باریكەكەی لە لەشی درێژترە. |
| سيفالاسبيس | Cephalaspis | ( سیفالاسپیس)، ماسییەكی بێچەناگەی قرتێكەوتووە. |
| سيقمور، سيكامور، قيقب، جميز، تين فرعون، سقوم، سوقم | Sycamore, Mulberry-fig | ( سایكامور)، هەنجیرە توو، تووە هەنجیرە، جۆرێكە لە درەختی توو، بەرەكەی لە هەنجیر دەچێت ، مەیلە و سوورە بۆ ڕەوانكردن باشە، تەختەكەی بەنرخە |
| سيكارة، لفافة | Cigarette, Cigar | جگەرە، جغارە. |
| سيكرومتر، مرطاب | Psychrometre | (سایكرومیتەر) دەزگایەكە بۆ پێوانی ڕادەی شێ لە هەوادا لە دوو گەرمیپێو ( تەرمومەتر) پێكهاتووە. |
| سيكلوغراف | Cyclograph | ( سایكلۆگراف)، دەزگایەكی ئەلكترۆنییە بۆ تاقیكردنەوەی كانزاكان بەكاردێت . |
| سيكوستيل | Cyclostyle | ( سایكلۆستیل)، ئامرازێكە بۆ چاپكردنەوەی ( دەرهێنانەوەی) وانەی تر لە ستێنسلەوە. |
| سيكلومتر | Cyclometer | ( سایكلۆمەتر)، پێوەری پێچی ( خولی) ڕەورەوە. |
| سيكولوجيا، سيكولوجي، علم النفس | Psychology | ( سایكولۆجی)، زانیاری دەروون، شتێك پەیوەندی هەبێت بە دەروونەوە. |
| سيكلامين | Cyclamen | بڕوانە ( سایكلامین). |
| سيكويا، سكوا، سكوية، شجرة عملاقة، جبارة، خشب احمر | Sequoia, Red wood, Wellingtonia | سیكویا، جۆرە درەختێكی بەرزی كەتەیە، لە كۆمەڵەی سنەوبەر ، تەختەكەی ڕەق و سوور و مەیلە و قاوەییە هەندێك جار نزیكەی (١٢٠) مەتر بەرز دەبێتەوە و تەمەنی دەگاتە چوار هەزار ساڵ. |
| سيكاه | | سێگا، سیگا، ئامرازێكی مۆسیقایە، مەقامێكە لە مەقامەكانی گۆرانی . |
| سيكران، سُخر، بنج ابيض | White henbane, Hyoscyamus-albus | بەنگی سپی، گیایەكە گوڵەكەی سپییە شلەیەكی ( بەنگی) لێدەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت . |
| سيكاتيف | Siccative | وشككەرەوە، مادەی وشككەرەوەی بۆیە و مەرەكەب . |
| سيكورتاه، تامين | Insurance, Assurance | سیگۆرتە، مسۆگەركردن، زامنكردن. |
| سيكورتاه الحريق، تامين ضد الحريق | Fire-Insurance | سیگۆرتەی ئاگربەربوونەوە، زامنكردن دژی ئاگربەربوونەوە. |
| سيكورتاه الحياة ، تامين علي الحياة | Life-Insurance | سیگۆرتەی ژیان، زامنكردنی ژیان . |

| | | |
|---|---|---|
| سيكلون | Cyclone | ( سایکلۆن)، ئامرازێکە بۆ جیاکردنەوەی تەپوتۆز لە گازەکان . |
| سيكاونيت | Cyclonite | ( سیکلونیت)، مادەیەکی ئەندامییە زوو دەتەقێت لە جەنگدا بەکاردێت. |
| سيكما | Sigma | ( سیگما)، سیتی ، نیشانەیەکە لە پیتی (σ) ی لاتینی یان (ß) ی ئینگلیزی دەچێت. |
| سيكلوهكسان ، هكسان حلقي | Cyclohexane | ( سایکلۆهێکسان)، هێکسانی ئەڵقەیی، مادەیەکی توێنەرەوەیە بۆ بەرهەمەکانی سلیلۆز و مۆم و ڕێسین و لاستیك. |
| سيكران منتن | Cicuta-virosa | سیکرانە بۆگەنە، ڕووەکێکی ژەهرینە. |
| سيكران اسود | Hyoscyamus-niger | هایۆسیامەسی ڕەش، ڕووەکێکی ژەهرینە لە کۆمەڵەی باینجان ئەترۆپینی لێدەردەهێنرێت . |
| سيكادة، زيز، زيز الحصاد | Cicada | ( سیکادە)، جۆرە مێش و مەگەزێکە . |
| سيكاس، سيكاد | | بڕوانە ( سایکاس). |
| سيكلوترون | Syclotron | ( سایکلۆترۆن)، دەزگایەکە بۆ خێراکردنی جووڵانەوەی وردیلەی پرۆتۆن و نیوترۆن و دیۆترۆن بۆ ئەوەی بگیرێنە ناوکی ئەتۆمەکان بۆ مەبەستی تەقاندنیان و بەرەڵاکردنی وزە . |
| سيكوتا السام، شوكران الماء، شوكران منيت، شوركان سام، قاتل البقر | Water hemlock, Cicuta, Cowbane | سیکۆتای ژەهرین، گاکوژ، شەوکەرانی ژەهرین ، ڕووەکێکە گوڵەکەی لە شێوەی چەتردایە . |
| سيل | Sil | ( سیل)، جۆرێکە لە خۆڵ و گڵی کانزایی. |
| سَيْل، سيول، فيض | Flood, Torrent | لێشاو، باراناو، لاقاو ، لێزماو، چۆڕاوگە، سوڵاف. |
| سيل الكتروني | Electronflood | لێشاوی ئەلەکترۆن. |
| سيلين، صمغ الذباب | Silene | زەمقی مێش، جۆرە گوڵێکە ز |
| سيلين | Silane | ( سیلین)، هایدریدی سیلیکۆن، گازێکە لە ئاودا ناتوێتەوە . |
| سيلان، علوك، نمنومة، سلينوس | Campion, Catchfly | ( کامپیون)، مێشگر، جۆرە گیایەکە لە کۆمەڵەی مێخەك بۆ مەبەستی ڕازاندنەوەی باخچە و پزیشکی بەکاردێت . |
| سيلانيز، خلات السليلوز | Celanase | سیلانیز، سرکاتی سیلیلۆز، مادەیەکە لە دروستکردنی ئاوریشمدا بەکاردێت. |
| سيلان، تعقيبة | Gonorrhea, Clap | سووزەنەك، نەخۆشییەکە بە هۆی مێکرۆبەوە تووشی ئەندامیس زاوزێ دەبێت لە ئەنجامی جوتگرتنەوە بڵاودەبێتەوە . |
| سيلان الدمع | Dacryorrhea | فرمێسك هاتنەخوارەوە . |
| سيلان اللبن، سيلان الحليب | Galacorrhea | مەمك بزوتن، زۆر هاتنەخوارەوەی شیر لە مەمکەوە. |
| سيلان، جريان | Flowing | ڕژان، هاتنەخوارەوە . |
| سيلان الانف | Gleet, Nose gleet | ئاوی لووت، ئەو ئاوەی کە بە لووتدا دێتەخوارەوە. |
| سيلان ، جارنيت | Garnet | ( گارنێت) ، بەردێکی بەنرخە بریتییە لە مەعدەنی سیلیکاتی سوور. |
| سيلفانيت | Sylvanite | ( سیلڤانیت)، فلۆریدی زێڕ وزیو بە شێوەی کریستاڵ لە بەردە ئاگرینەکاندا هەیە بریتییە لە کەرسەیەکی خاوی زێڕ . |
| سيلفينيت | Sylvinite | ( سیلڤنیت)، تێکەڵاوێکە لە خوێی سیلڤیت و هالیت لە ناوچەی ستاسفورت هەیە . |
| سيلفيت، سيلفين | Sylvite, Sylvine | ( سیلڤیت)، ( سیلڤین)، کلۆریدی پۆتاسیۆمی سروشتی بە شێوەی کریستاڵی خشتەکی لە نزیك بورکانەکاندا هەیە، سەرچاوەیەکە بۆ ئاوێتەکانی پۆتاسیۆم بە شێوەی پەین بەکاردێت . |

| | | |
|---|---|---|
| سيلوسولف | Cellosolve | ( سيلۆسۆلف)، مادەيەكە بە باشى سليلۆز دەتوێنێتەوە لە پيشەسازى مينادا بەكاردێت . |
| سيلاستيك | Silastic | ( سيلاستيك)، جۆرێكە لە لاستيك، پۆليمەرى ئۆرگانيكى سيليكۆنى تيادايە . |
| سيلكوفليكس | Silco-flex | ( سيلكۆفلێكس)، جۆرێكە لە لاستيك لە موتۆر و داينەمۆى گەورەدا بەكاردێت . |
| سيلفليك | Silfake | ( سيلفلێك)، جۆرێكى پاكە لە زيو. |
| سيلوفان | | بڕوانە ( سلوفين). |
| سيلينيت، حجر القمر | Selenite | ( سێلينيت)، بەردەمانگ، جۆرێكى بلورى ڕۆشنە لە گەچ. |
| سيلينوم | Selenium | ( سيلينيۆم)، توخمێكى كيمياييە نيشانەكەى (Se) ، كێشە ئەتۆمييەكەى (٧٩) ، ژمارە ئەتۆمييەكەى (٣٤) ، نيمچە كانزايەكى ڕەنگ خۆڵەمێشييە ماناكەى لە شووەى ( سيلين) واتە ( مانگ) وەرگيراوە. |
| سيلليلويد | | بڕوانە ( سلولويد). |
| سيلنيوغرافيا | Selenography | ( سيلينۆگرافى)، جيۆگرافياى ڕووى مانگ. |
| سيلوري | Silurian | ( سيلوريان)، سەردەمێكى كۆنە دەگەڕێتەوە بۆ (٣٧٥) مليۆن ساڵ لەمەوبەر بەسەر زەويداس تێپەڕبووە. |
| سيليزي | Silesia | ( سيليزيا)، قوماشێكى لۆكە يان كەتانى تەنكە. |
| سيلاتوسوما | | (سيلاتۆسوما)، جۆرێكە لە قالۆنچە . |
| سيلستيت | Celestite, Celestine | ( سيلستيت)، ( سيلستين)، گۆگرداتى سترۆنتيۆمى سروشتى بە شێوەى كريستاڵ لە خوێى بەردين و گەچدا هەيە . |
| سيلوفيسيس | Coelophsis | ( سيلۆفيسيس)،س گياندارێكى كەتەى ڤرتێكەوتووە . |
| سيما | Sima | ( سيما)، چينى ناوەوەى توێكڵى زەوى كە سليكاى كەمە و مانيزياى ( مەكنيسيا) ى زۆرە . |
| سيماء، سيمة هئية | Look, Mien | شێوە، ئادگار، ڕوو، ڕووخسار، دەموچاو، ڕووچاو، چارە، سەروسيما، ڕەنگوڕوو. |
| سيمانغ | Semang | ( سيمانگ)، كۆمەڵە مرۆڤێكە لە نيمچە دوورگەى مالايو دەژين . |
| سيمازين | Simazine | ( سيمازين)، جۆرێكە لە كرێزۆڵ بۆ كوشتنى گژوگياى زيانبەخش لەناو دەغڵودان بەكاردەهێنرێت . |
| سيمائية ، علم الاعراض | Semeiology | ( سيميۆلۆجى)، لقێكە لە زانستى پزيشكى، باسى نيشانەكانى نەخۆشييەكان دەكات . |
| سيمافور، مُلَوِّح | Semaphore, Signal post | ( سيمافۆر)، دەزگايەكە بۆ ڕێكخستنى ڕۆيشتنى شەمەندەفەر. |
| سيمار | Cimar | ( سيمار)، جۆرە جلوبەرگێكى ئافرەتە. |
| سينما، دار سينما | Cinema | سينەما، شێوەنما. |
| سينماتوغراف، الصور المتحركة | Cinematograph, Moving pictures | سينەماتۆگراف: ١. دەزگايەكە بۆ پيشاندانى وێنەى تارمايى لەسەر پەردەيەكى سپى. ٢. كامێراى سينەمايى. |
| سينما فلكية ، بلانتيريوم | Planetarium | (پلانيتاريۆم)، سينەماى چەرخ، گومەزێكى دەستكردە جووڵانەوەى ئەستێرەكانى لەسەر پيشان دەدرێت . |
| سينوكس | | ( سينۆكس)، دەرمانێكە بۆ قەلاچۆكردنى گژوگياى ناوباخ بەكاردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| سینراما | Cinerama, Cinorama | ( سینۆراما )، دەزگایەکی سینەمایی‌یە ئامرازێکی تازەی لەسەرە وا لە وێنیە ئەو شتانە دەکات کە لەسەر پەردەکە نیشان دەدرێن ، کە وەکو وێنەیەکی سروشتی دیاربن . |
| سینا | Sienna | ( سینا، ئۆکسیدی ئاسن، ڕەنگەکەی زەردە لە بۆیەدا بەکاردێت . |
| سینابار | | بڕوانە ( سنبار). |
| سینکروترون | Synchrotron | ( سینکرۆترۆن)، دەزگایەکە بۆ زیادکردنی خێرایی پرۆتۆنەکان . |
| سیکروسایکلوترون | Cynchro-cyclotrom | ( سینکرۆسایکلۆترۆن)، دەزگایەکی خێراپێکردنە، خێرایی ئەو تەنۆکانەی کە تیایدان دەگەیەنێتە خێرایی ڕووناکی . |
| سینکرونومتر | Synchronometer | ( سینکرۆنۆمەتر)، ئامرازێکی ژمێرەرە بۆ ڕێکخستنی کات، ژمێرەرێکی لەرەیە بۆ ڕێکخستنی هاوکاتی ( تزامن). |
| سینغام، دودة حمراء، دودة مزدوجة | Syngame | (ساینگام)، کرمە سوورە، کرمە جووتە، کرمێکی باریکی مشەخۆرە لە کۆئەندامی هەناسەدانی هەندێك باڵندەدا دەژین ، نێرومێکەی پێکەوە نووساون. |
| سیناریو | Scenario | ( سیناریۆ)، دەقی سینەمایی، دەقی ئەو چیرۆکەی کە دانراوە بۆ دەرهێنان. |
| سینکونا، کنکینا، کینا | Cinchona, Quinin bark | ( سینکونا)، قەنەقینە، دار و دەوەنێکە لە ناوچە گەرمەکاندا دەڕوێت ، مادەیەکی ئەلکالی سپی زۆر تاڵ لە توێکڵەکەی دەردەهێنرێت بۆ دروستکردنی ( کنین) وەکو دەرمانی لەرزوتا بەکاردێت . |
| سینکوفین | Cinchophen | ( سینکۆفین)، درەمانێکە بۆ چارەکردنی تا . |
| سینکونین | Cinchonine | ( سینکۆنین)، مادەیەکە لە تەختەی داری سینکۆنا دەردەهێنرێت . |
| سینومیس | Cynomys | ( ساینۆمایس)، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە کۆمەڵەی سمۆرە ڕەنگەکەی خۆڵەمێشی‌یە بە شێوەی پۆل دەژی، لە زستاندا خۆی لە ژێر زەویدا مت دەکات . |
| سینیوریة | Coenurosis | ( سینۆریا)، نەخۆشی بەلاداکەوتن یان بازدان لە مەڕوماڵاتدا لە ئەنجامی تووشبوون بە کرمی شریتی پەیدا دەبێت. |
| سینوزوي | Cenozoic | سەدەی ژیانی نوێ. |
| سیهك | Dust | تەپوتۆز. |
| سیوان | Cephalaria | ( سیفالاریا)، گیایەکی دەشتەکی‌یە گوڵی زەرد دەگرێت . |
| سیولة، میوعة | Fluidity, Liquidty | شلێتی، شلەیەتی . |
| سَیوُن | Cionus | ( سیۆنەس)، مێروویەکی زیان بەخشە لە کۆمەڵەی مۆرانە . |
| سینیکا، سینیجا | Seneca-root, Seneca snake root, Polygala senega | ڕەگی سینیکا، ڕەگی مار ، ڕووەکێکە لە دروستکردنی دەرمانی ڕەوانی و میزپێکردن و دژی ژەهری مار بەکاردەهێنرا ، ئێستا لە دەرمانی کۆکەدا بەکاردێت . |

| | | |
|---|---|---|
| شائخ/ كهل | An oldman, elderly | پیر، تەمەن درێژ، بە تەمەن، بەساڵاچوو. |
| شائب/ كهل/ رجل عجوز | Grey, headed, Gray beard | پیر، بەساڵاچوو. |
| شائك | Thorny, prickly Acanaceous | چقڵاوی، دڕکاوی. |
| شائك القرن | Prong- horn | شاخ دڕکاوی، فیلەگێژە، جۆرە ئاسکێکە شاخەکەی دڕکاوی‌یە لە باکوورو خۆرهەڵاتی ئەمریکاو کەنەدادا دەژی. |
| شائبة عيب | Defect, fault, Vitium, Vitiate | نەنگی، کەموکوڕی، کێماسی. |
| شائب(شوائب)، حثالة | Dregs, sediment, Admixture | خڵتە، سەرکۆزەر، کوزەرە، بن بێژنگ، خەوش، گەرد. |
| شائع | Widespread | بڵاو، باو،باد،بەلاف. |
| شائكات الراس | Acanthocephala | سەردڕکاوی، جۆرە کرمێکی دەزوولەیی‌یە سەری دڕکی پێوەیە. |
| شائكات الزعانف | Acanthopterygian spiny-rayed fishes | پەڕکە دڕکاوی، ماسییە پەڕەکە دڕکاوی‌یەکان. |
| شائل الذنب | NicKed (horse) | کلکگرتوو، ئەو ئەسپەی کە هەمیشە کلکی بەرز کردۆتەوە. |
| شائبة صفراء | Yellow spot | زەردەپەڵە، پەڵەیەکی زەردە لەسەر تۆڕینەی چاو، بینینی تیادا بەهێزە. |
| شاب | A youngman, A youth | گەنج، لاو، ڕۆڵە، ڕەوال، خورت، جحێڵ، لاوێك تەمەنی لە ١٥-٣٠ ساڵ بێت. |
| شابة، فتاة | A young woman, A malden | کچ، کیژ، کەنیشك. |
| شاب صغير | Young | لاو، کوڕێکی دەستە. |
| شابابك، ساهبانج، شاه بابك، شابانج، شاقافك، بنفسج الكلاب، برنوف، عشبة البراغيث، شيخ الربيع/ اريغارون، رعراع ايوب، بذرقطونا | Flea wort, Flea bane Erigeron | گیاکێچ، شابانە، وەنەوشە، سەگانە، ڕووەکێکی پزیشکی‌یە لە قەراغی جۆگەکاندا دەڕوێت، کێچ دەکوژێت گوڵەکەی زەردو تاڵو بۆنخۆشە. |
| شابرة الماء، زخرف، قمص خيتحور | Water striders, Hy- drometra | ئاوپێو، ئاو ڕۆشنکەرەوە، جۆرە مێرووییەکە بەسەر ئاوەوە هاتوچۆ دەکات وەکوو بیپێویت، وایە لەشەکەی باریکە، پەلەکانی درێژو باریکن.شابل. |
| شابل، صابوغة | Allice shad, Allis shad, Alosa | (شاد) جۆرە ماسی‌یەکی لەش قوپاوە. |
| شابن | Stout and fat | قەڵەو، گیانداری قەڵەو. |
| شاة، نعجة، ضأن، غنم، خروف | Ewe, sheep | مەڕ، کاوڕ، بەران. |
| شاة | Capricorn | بەران، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| شاة، مارينو | Merino (sheep) | بەرانی مارینۆ، مەڕی مارینۆ، مەڕێکی ئیسپانیی سپییە. |
| شاتن، معتم، شرصوف | Light light | هەر مادەیەك ڕووناکی پیادا تێپەڕ نەبێت. |
| شاجة، شاقة | MORAY, Muraena | (مۆری مورواینا) جۆرێکە لە ماسیی نقە. |
| شاجر | Living in trees | دارەوان، درەختەوان، ڕەزڤان، گیاندارێکە لەسەر درەخت بژی. |
| شاحب | Wan, Sallow, pale and sickly | ڕەنگپەڕیو، کاڵ، هەڵگەڕاو. |
| شاحنة ، سيارة الشحن | Dray, Truck | (فارگۆن)، ئوتوموبیلی بارهەڵگرتن. |
| شاحنة مغطاة | Van | فارگۆنی سەرداپۆشراو. |
| شاحن، مشحون | Freighted, Loaded | بارکراو، بەرگەکراو. |

| | | |
|---|---|---|
| شاحوطة، حجارة | Stone cutter | پیك، ئامرازی بەردتاشین. |
| شاخص، محملق | Staring, Gaze | چاوتێبڕ. |
| شاخص (المهندس) | Ranging road, stadid rod, ranging pole | نیشانە، سنگ، مێخ، مێخێکە درێژییەکەی دوو مەتر دەبێ بۆیەی سوورو سپی یان سوورو رەش کراوە، بۆ ئەوەی لە دوورەوە ببینرێت بۆ پێوانی ماوەی دوو شوێن بەکار دەهێنرێت. |
| شاخص (مزولة) | Gnomon | میلی کاژمێری خۆریی. |
| شاد | Tensor | بەستەر، شتێك بۆ بەستن بەکاربێت. |
| شادن | Fawn | بێچوە ئاسك، مامز، شەمکۆر. |
| شادي، هجرس سبا | Grivet | (گریفیت)، جۆرە مەیمونێکی بچووکی کلکدارە. |
| شادوف | Well-sweep, Loaded-Lever, shadoof | جەنجەر ، ئامرازێکی کۆنە بۆ هەڵهێنجانی ئاو لە شوێنێکی نزمەوە بۆ شوێنێکی بەرز سەتڵێکی پێوەیە. |
| شادوك، بوميلو، سندي، ليمون هندي، ليمون الجنة | Grape fruit, shad-dock | سندی، جۆرێکە لە لیمۆی ترش، گەورەیە توێکڵەکەی سەوزە. |
| شادنج، حجر الدم، شاذنة | Haematite, blood stone | بەردەخوێن، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی ئاسن، رەنگەکەی دۆشاوییە، بریتییە لە ئۆکسیدی ئاسن، جۆرێکە لە یاقیق، رەنگەکەی سەوزە پەڵەی سووری تیادایە. |
| شاذ، لاسوي | Abnormal, anomalous, rare | دەگمەن، هۆرت، نائاسایی، ناقۆڵا، ناوازە، نورەك. |
| شاذروان، نافورة | Fountain | فوراە، فوارەی ئاو. |
| شار، مقرص | Urticant | لێراویی، کەسێك تووشی لێر بووبێت. |
| شاري، دافع الصاعقة | Lightning-conductor | تریشقەگر، شیشی تریشقە، شیشی تریشقەگر. |
| شاري، مشتري | Buyer, Vendee | کڕەر، بکڕ. |
| شاروق، الجبس، الجص | Gypsum | گەچ، قسڵ. |
| شارب | Drinker | قەخۆر، ئەو کەسەی کە ئەلکهول زۆر دەخواتەوە |
| شارب الدم، ماص الدم | Sanguivorous | خوێن خۆر. |
| شارب، شنب | Barb, Moustache | سمێڵ، سمبێڵ. |
| شاربان كبيران | Mustachio | سمێڵی گەورە. |
| شارب القط | Whiskers | سمێڵی پشیلەو گیانداری تر. |
| شارع | Street | شەقام، جادە. |
| شارد، نافر | Fugitive,runaway | تەرە، سرك، بەسەلە، ئاوەکی، پەیتەشە، ئاوارە. |
| شاردة، ايون | Ion | (ئایۆن)،گەردیلەیەك یان رەگێکی کیمیایی کە لە ئەلکترۆنێك یان زیاتری وەرگرتبێت یان ونکردبێت. |
| شاردة، حرورية، ثرميون | Thertmion | (پێرمیون) ئایۆنی گەرمیی. |
| شاردة موجبة | Cation | (کاتایۆن) ئایۆنی بارگە موجەب. |
| شاردة سالبة | Anion | (ئەنایۆن) ئایۆنی بارگە سالیب. |
| شارد الفكر | Absent- minded-moony, abalienated | فکر ڕۆیشتوو، خەیاڵ ڕۆیشتوو. |
| شارفات الأجنحة | Palmipennes | پەڕ لە پێیەکان، جۆرە مێروویەکی بە کەڵکی مژۆکە. |
| شارة، علامة | Badge, Mark, Sign | دروشم، نیشانە. |

| | | |
|---|---|---|
| شارة، فلمية | Film padge | دروشمی فیلیمی ئامرازێکه له کانزا یـان پلاستیك یـان کاغەز فلیمێکی پێوەیە ، ئەو فلیمە کەدەردەکەوێت بری تیشکی ئایۆنکراو پیشان دەدات، بە ئەموستیلە یان بازنیشەوە قایم دەکرێت. |
| شارلستون | Charleston | (شارلستۆن) جۆرێکە لە سەما. |
| شازب، نحیل، شاسب، شاسف | Thin, lean, Meagre, Dry | لەر، لاواز، جیقن. |
| شاشة | Screen | پەردە. |
| شاشة بیضاء | White screen | پەردەی سینەما، پەردەیەکی سپییە وێنەی سینەمای لەسەر دەردەخرێت. |
| شاشة الرادار | Radar scope | پەردەی رادار. |
| شاشة فلوریسینت | Fluorescent, screen | پـەردەی فلۆریسـینت، بەشـێکە لـە بـۆری تیشـکی کاسـۆدی کـە پەڵـە رووناکییەکەی لەسـەر دەردەکـەوێت و بریتییـە لـە چینێـك لـە مادەیـەکی فلۆریسینتی کە تیشکی ئەلەکترۆنەکەی ئاراستە دەکرێ. |
| شاشة مراقبة | Monitor screen | پـەردەی چاودێریکردن، پەردەیەکـە وێنـەی تەلـەفزیۆنی لەسـەر پیشـان دەدرێت لە ئێستگەی تەلەفزیۆندا. |
| شاش القاضي، زهر اللؤلؤ | Daisy | (دیزی)، گیایەکە گوڵی جوانی هەمەرەنگ دەگرێت. |
| شاش، غزي، موزلین | Muslin, Gause | شـاش، مەلمـەل، سـارغی، قوماشـێکی لۆکـەی تـەنکی شاشـە بـۆ بریـن پێچانەوە بەکاردێت. |
| شاص، متوتر | Stiff | کرژ، گرژ. |
| شاصي السيارة، شاسي السيارة | Chassis | شاسی ئوتومۆبیل، پەیکەری ئوتومۆبیل، بە ئامرازەکانیەوە. |
| شاصر | Fawn | بەچکە ئاسك. |
| شاطر | Active | چاپووك، ئازا، زیرەك، زرنگ، چالاك. |
| شاطيء، ساحلي | Littorial | کەناریی، شتێك پێوەندی هەبێت بە کەناری دەریاوە. |
| شاطيءالبحر | Edge, shore, sea, Beach | کەناری دەریا، قەراغی دەریا، دەریادەر. |
| شاطيء كثير الأحجار | Stony sea shore | بەستێ، قەراغی رووبار کە بەردەڵانی بێت. |
| شاطرة، بطونيقا طبية | Botony | پاتۆنیای پزیشکی، گیایەکە گوڵەکەی پەمبەی یان سوورە. |
| شاعب، مشعب | Branching | لقدار، درەختێکی لقی زۆری پێوە بێت. |
| شاغر | Unoccupied, Vacant | بەتاڵ، بۆش، نەگیراو. |
| شاغي، شاغ، غیرماوي | Unequal | ناڕێك، نایەکسان. |
| شافي، شاف | Curative | چاککەرەوە، دەرمانێکی چاککەرەوە. |
| شافة، قرحة | Ulcer | دوومەڵ، برین. |
| شافة، تقرن | Fester | بزمارۆك، قویسان، مێخەکە. |
| شافة، اصل، جذر | Root | بنەرەت. |
| شافر، شفر | lip of Vulva | لچی شەرمگا. |
| شافع، كبش | Ram | بەران، مەری نێر. |
| شول البناء، فادن مطمر | Plumb-line | شاوول، پارچە کانزایەکی قوچەکییـە، دەزوویـەکی پێوەیـە بـەنا بـەکاری دەهێنێت بۆ دۆزینەوەی ڕێکیی قیتی دیوار. |
| شاقول، میزان الماء | Spirit-level | تەرازووی ئاوی. |
| شاقولي | Columnar, vertical | شاوڵی قیت. |

| | | |
|---|---|---|
| شاقوف، مطرقة | Iron-hammer | چەکوشی ئاسن، جۆرە چەکوشێکە لە ئاسن دروستکراوە. |
| شاکوش، مطرقة | Hammer | چەکوش، مێخکوت. |
| شاكە | Burr, rosy spined, bur | گوڵە باخەزەردە، جۆرە گوڵەباخێکە گوڵی زەرد دەگرێت. |
| شاکة- حرقة في اللوزتين | Quinsy<br>Acute-tonsillitis | (١) دوومەڵی دەوری ئاڵوو.<br>(٢) سووتانەوەی ئاڵوو بەشێوەیەکی بە تین. |
| شاکلة، اطل ، خاصرة | Flank, Waist | کەلەکە، نافتەنك. |
| شاکلة، نوع | Kind, Nature, sort | جۆر، تەحر. |
| شال | Shawl | شاڵ، بۆزۆ، جۆرە چنراوێکە |
| شال، لفاع، لفيحة، کوفية | Shawl, muffler | ملپێچ ، شاڵ، پۆشاکێکە دەخرێتە سەر هەردوو شان. |
| شال کشميري | Kerseymere | تورمە، جۆرە قوماشێکی خورییە. |
| شال | Synodontis, schall | شالە، جۆرێکە لە ماسی. |
| شالکانيت | Chalcanthite | (کالکـانثیت)، کوپـەریك، سـولفەیتی ئـاوی، زاجـی شـینی سروشـتی، کەرەسەیەکی خاوە بۆ مس. |
| شالوف، شلال | Waterfall | تاڤگە، سولاف، سیلاف. |
| شالم، شولم، شيلم، زؤان، براکة | Rye, Darnel | زیزانە، مرۆر، جۆرەشە، پارشت. |
| شامة وداء | Cancerous, mole cancroid-mole | ئەو خاڵەیە کە لەسەر پشتی منالـی ساوا (منالی کۆرپـە) پـەیدا دەبێـت، جاری وا هەیە دەبێت بە شێرپەنجە. |
| شامة، خال، نقطة عنبر | Mole, Lentigo, Mother, Birth mark, lenticula | خاڵ، نیشانە. |
| شامبو | Shampoo | (شامپۆ)، دەرمانێکە بۆ ئەمێشتنی کرێشی سەر، قژی پێ دەشورێت. |
| شامل | Inclusive | تەواو. |
| شامتة، وصل، احد اطراف الحيوان | Limb | لاق، لاقی چوارپێ. |
| شامذ، شماذ | Theridion | جۆرێکە لە جاڵجاڵۆکە. |
| شاما | Shama | (شاما) جۆرە باڵندەیەکی کلك درێژە لە دارستانەکانی هیندو ئەندنۆسیا دەژی. |
| شامخ، عالٍ | High, Lofty | بڵند، بەرز. |
| شامخة، حدبة، زائدة | Excrescensce | نووکە چوکلە. |
| شان | Suture of the cranium | درزی کاسەی سەر. |
| شان، قناة دمعية | Tear duct | بۆریی فرمێسك. |
| شانك | Acantho pagrus-berda | شانەك، جۆرە ماسییەکی ناو رووبارە شیرینەکانە. |
| شاهد | Witness | بینەر، شایەت، شایەد. |
| شاهترج، سفرة الحمار، قلة الملك | Fumitory, fumaria, ramping-fumitory | شاتەرە، شاپاقە، گیایـەکی سـاڵانەی وردە، قـەراغی گەڵاکـەی دداندارە، گوڵەکەی بەشێوەی هێشووە، سپی مەیلەو پەمبەییە، گەڵاو تۆوەکەی بـۆ چاککردنەوەی خوروو و گەریی بەکار دەهێنرێت، ئەگەر گەڵاکەی بپروێنیت بۆنێکی تیژی لێ دێت، ئاو بە چاو دەکات. |
| شاهسفرم، حبق صغير، ريحان الملك | Small-basil, Sweet-basil | رێحانە شیرینە، ریحانە بچکۆلە، جۆرێکە لە رێحانە گوڵەکەی پەمبەییە. |
| شاه اسبرمی رومي، حزامي بحرية | French lavender, stoechas | لاوەنتەی دەریا، گیایەکە گوڵی بنەوشەیی دەگرێت، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شاهق، شامخ | Towering, High | بەرز، بڵند. |
| شاهين | Peregrine, falcon, Royal Falcon, shahin | شاڵە، شەنهادو، شایەن، شەهێن، شاهۆ، پالاوان، لاشین، شابان، شاوە، جۆرێکە لە هەڵۆ، پەڵەی رەش و سپی بە گوێچکەکانیەوەیەتی، سەری رەشە، سەرووی لەشی خۆڵەمێشی و مەیلەو شینە، دەنووکی خۆڵەمێشییە، باڵی درێژەو باڵندەی ئاوی دەخوات. |
| شاهين | Aquilae, The falcon | شاهۆ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| شاهدة القبر، بلاطة الضريح | Tombstone, Grave-stone | کێلی گۆڕ، نیشانەی گۆڕ، سەلین. |
| شاهبلوط، كستناء، قسطل، ابو فروة | Sweet chestnut, Cas tanea | شابەروو، کەستانە، درەختێکی گەورەیە، گوڵی نێرو مێ بەجیا دەگرێت، بەرەکەی رەق و قاوەیی و گەورەیە، کاکڵەیەکی نیشاستەیی خۆشی هەیە. |
| شاه، باز بازي | Go shawk | باز، شاباز، باڵندەیەکی درندەیە رەنگەکەی قاوەییە. |
| شاه صيني، تامول، تنبل | Betel peper, betel, vine | بێتلی بیبەری، رووەکێکە لە کۆمەڵەی بیبەر لە هیندستان هەیە، گەڵاکەی دەجوون،یان مادەیەکی پاکژکەرەوەی (معقم) لێ دەردەهێنن، بەرەکەی لە گوێز دەچێت رەنگی سووری لێ دەردەهێنرێت. |
| شاهبانج | | بڕوانە (شاباێك). |
| شاهبلوط، برنوف، شاهبلوط الحصان، القندلي الهندي، قسطلة الحسان، قسطل الهند | Horse chestnut | کەستانەی ئەسپ، درەختێکە بەرەکەی نیشاستەییە لە کەستانە دەچێت، بەڵام تاڵە بەشێوەی ئالیك دەدرێت بە ئاژەڵ. |
| شاوا، كسو | Kusso, Tape Worm plant | کەسوو، درەختێکە گوڵەکەی بەشێوەی هێشووە دەرمانی لێ دەردەهێنرێت. |
| شاورمة، تكة | Rosted meat | تکە، گۆشتی برژاو بە شیش. |
| شاي | Tea | چایی، چا، دەوەنێکی هەمیشە سەوزە بەرزییەکەی نزیکەی دوو مەتر دەبێت گوڵەکەی سپیی مەیلەو زەردە، گەڵاکەی بۆنخۆشە، مادەیەکی وریاکەرەوەی تێدایە لە ئاودا دەکوڵێنرێت و دەخورێتەوە. |
| شاي العرب، قات، ضاي العرب | Catha, Khat, Kat, cafta, Arabian tea | قات، چای عەرەب، دەوەنێکە، گوڵەکەی سەوزە، بەرەکەی وردەو ترش و تفتە دەخورێت گەڵاکەی لە هەندێك شوێن دەجورێت چونکە وریا کەرەوەیە. |
| شاي اوزويغو | Oswego tea | چای ئۆزوێگۆ، جۆرێکە لە دەوەنی چایی، گوڵەکەی سوورە. |
| شاي كندا | Tea berry | چای کەنەدا، دەوەنێکی خۆهەڵواسەری هەمیشە سەوزە گوڵەکەی زەنگۆڵەیی و سپییە، سوورە، رۆنێك لە گەڵاو بەرەکەی دەردەهێنرێت بۆ بۆنخۆشکردنی شەراب. |
| شاي بري | Wild tea, Lead plant | چاییە کێویلە دەوەنێکە لە دەوەنی چایی دەچێت. |
| شاي نيوجرسي | Newjersey-tea, Red-root | چای نیوجێرسی، دەوەنێکە لە کۆمەڵەی تاوك گەڵاکەی وەکوو چایی بەکاردێت. |
| شاي لبرادور، شاي المناقع | Labrador-tea, Crystal tea | چایی لەبرادۆر، دەوەنێکە گەڵاکەی وەکوو چایی لە ئەمریکا بەکار دەهێنرێت. |
| شاي برازيلي، جيرفاو | Brazilian-tea, Gervao | چایی بەرازیلی، جێرڤاو، دەوەنێکە لە بەرازیل دەروێت، گەڵاکەی وەکوو چایی بکاردێت. |
| شاي البوربون، فهام | Bourbon-tea faham | چایی بۆربۆن، رووەکێکە لە کۆمەڵەی سەعلەم لە ئەفریقا دەروێت، گەڵاکەی بۆنخۆشە وەکوو چایی بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شاي المستنقعات | Marsh-tea | چای زەلکاو، جۆرە ڕووەکێکە. |
| شاي جبلي | Mountain-tea | چاییە کێویلە، جۆرە ڕووەکێکە. |
| شاي احمر، شاي كجرات، شاي كوجرات | Gujarat-tea | چایی کۆجرات، چای کۆجەرات، ڕووەکێکی ساڵانەی بەهێزە، نزیکە دوو مەتر بەرز دەبێتەوە، گەڵاکانی هێلکەیی سەوزی مەیلەو سوورن، کاسەی گوڵەکەی سوورە، بەڵام پەڕی گوڵەکەی زەردە، کاسەی سوورەکەی و گەڵاکانی وشك دەکرێنەوە چایەکی ترشی لێ دروست دەکرێت، لە هەندێ وڵاتدا لەجیاتی دۆشاوی تەماتە دەکرێتە چێشتەوە. |
| شاي المكسيك، زربيع | Mexican-tea worm, seed, mexican, goose-foot | چایی مەکسیك، گیایەکە گەڵاکەی بۆنخۆشە وەکوو چایی بەکاردێت. |
| شاي استرالي، فشاغ حلو الورق | Australian tea, Botany-Bay tea | چای ئوستراڵی، چای ماڵ ڕووەکێکە لە ئەمریکای باشووری دەڕوێت گەڵاکەی وەکوو چایی بەکاردێت. |
| شاي براغواي مالي، بهشية الشاي | Paraguay-tea, mate | چایی پاراگوای، ماتی، درەختێکی گەورەیە بەرەکەی سوورە، گەڵاکەی وەکوو چایی بەکاردێت. |
| شاي المروج، قسوش | Crysttal-tea-marsh-cystus-marsh-rosemary | چایی بلووریی، چایی مێرگ، ڕووەکێکە گوڵەکەی ئەستێرەی سپی و بۆنخۆشە گەڵاکەی بۆنخۆشە وەکوو چای بەکاردێت. |
| شاي اسود | Bohea | چایی ڕەش. |
| شاي صيني | Tea-plant, Chinese tea | چایی چینی بەناوبانگترین جۆری چاییە. |
| شاي اخضر | Hyson | چایی سەوز، دەوەنێکە، لە چین دەڕوێت. |
| شاي بنسلفانية | Mountain-tea, Oswege tea | چای پەنسلڤانیا، گیایەکە گوڵەکەی هێشوویی و ئەرخەوانییە، گەڵاکەی بۆنخۆشە وەکوو چایی بەکاردێت. |
| شايين، تيئين | Theine,Thein | (تینین) مادەیەکی ئەلکالییە، لە گەڵای چاییدا هەیە. |
| شايخ النظر، طويل النظر | Presbyope | دووربین، دریژبین. |
| شاير | Shire | (شایەر)، جۆرە ئەسپێکی بیانییە بۆ بارهەڵگرتن بەکاردێت. |
| شباك | Windon | پەنجەرە. |
| شباك، الداء الشبكي | Reticulosis | زۆربوونی خانەی تۆڕی لە خوێندا. |
| شباك الحبايب، كعكة الورد | | حوسنی خان، جۆرێکە لە شیرینیی لە ئاردو نشاستەو هێلکەو شیرو پاوەرو شیلەو ڕۆن دروست دەکرێت. |
| شباهة | Resem teseblance | لە یەکچوون. |
| شبا (الشبا) | Alchiba | ئەلشەبا، ناوی ئەستێرەیەکە. |
| شباب شبيبة | Youth | گەنجی، لاوی، خورتی، جحێڵی. |
| شباط | February | ڕێبەندان، ڕەشەمێ، ڕەشەمە، بارەبەران، مانگی دووەمی ساڵ (٢٨ یان ٢٩) ڕۆژە. |
| شباة | Coleophora | کۆلیۆبۆرا، پەپوولەیەکی ڕەنگینی زیانبەخشە بە ڕووەك. |
| شبا | Duck weed | قەوزە، کەڤز، چووزەوارە. |
| شباة | Young Scorpion, YellewScorpion | بەچکە دووپشك، دووپشکی زەرد. |
| شبارس، سبارس، سرغوس | Sar,sargo, sparus | (سپارۆس)، جۆرە ماسییەکی بچووکی دەریایی شێوە هێلکەییە، دەخورێت. |
| شبام اسكمية | Skimmia | (سکیمیا)، دەوەنێکی ڕازاندنەوەیە گوڵەکەی بۆنخۆشە، بەرەکەی لە ترێ دەچێت، سوورە دەخورێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شبانك | | بڕوانە (شاباك). |
| شبارق، شبرق، تين القدماء، كشعل | Tall rest harrow, On onis | دارو دەوەنێکە ڕەگەکەی ئەستوورە گەڵاکەی ئاوێتەو سەوزە، گوڵەکەی بەشێەی هێشوویەکی زەردە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| شب، حجر الشب | Alum | زاخ، وشەی زاخ بریتی‌یە لە ژمارەیەکی گەورە لە ئاوێتەی شێوە هاوتا لە پێکهاتنیاندا گۆگرداتی توخمێکی تاك هاوهێزیو توخمێکی سێ هاوهێزیو (١٢) یان (٢٤) گەرد، ئاوی بلوریان تێدایە. |
| شب البوتاسيوم ،شب يماني | Potassium, alum | زاخی پۆتاسیۆم، ئاوێتەیەکە لە گۆگرداتی پۆتاسیۆمو گۆگرداتی ئەلمنیۆمو (٢٤) گەرد ئاو پێکهاتووە، بۆ مەبەستی ڕەنگکردنو ڕوونکردنەوەی ئاوی خواردنەوەو دەباخکردنو پزیشکی بەکاردێت. |
| شب الكروم | Chrome-alum | زاخی کرۆم، بریتیە، لە گۆگرداتی پۆتاسیۆمو کرۆمو (٢٤) گەرد ئاو، ڕەنگەکەی ئەرخەوانییە بۆ ڕەنگکردنو دەباخی بەکاردێت. |
| شب الأمونيوم | Ammonlum | زاخی ئامونیوم، بریتیە لە گۆگرداتی ئامۆنیومو ئەلەمنیۆمو (٢٤) گەرد ئاو بۆ ڕەنگکردنو ئاو پاکردنەوە بەکاردێت. |
| شب الصودا، شب الصوديوم | Sada alum | زاخی سۆدا(سۆدیوم) بریتیە لە گۆگرداتی سۆدیۆمو ئەلەمنیۆمو (٢٤) گەرد ئاو، بێڕەنگە لە دروستکردنی سیرامیكو دەباخکردنو شقارتەو مەرەکەبدا بکاردێت. |
| شب زائف | Pseudo alum | گەندەزاخ، بریتیە لە زاخی ئاسایی، بەڵام لە جیاتی کانزای تاك هاوهێزی، کانزای جووت هاوهێزی تیادایە. |
| شب الليل، نوار الليل، شواق، شب الطريف، شجرة الليل، عباد القمر | Common four-oclock plant, Marvel of perv, Mirabilis | گوڵە سەعات چوار، گیایەکە ڕەگەکەی لە شێلم دەچێت، گوڵەکەی لە زوڕنا دەچێتو ڕنگینە بەشەو دەگەشێتەوە. |
| شب النهار، لبلاب مثلث الألوان | Three coloured bind weed | ڕۆژبۆ، گیایەکە لە کۆمەڵەی لاولاو ، گوڵەکەی لە زوڕنا دەچێتن پەڕکەی شینەو بنکەکەی زەردە، بە ڕۆژ دەکرێتەوەو بە شەو دادەخرێت. |
| شبب | A young ox, steer | پارێن، نوێنگێن. |
| شبت، شبند | Dill, Anet, fennel, anethum | شیوت، شویت، جۆرە گیایەکە گەڵاکەی وردو بۆنخۆشە، گوڵەکەی وەك چەتر وایە، دوای وشککردنەوە دەکرێت بە بەهارات، ڕەگو گەڵاو تۆوەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| شبت بري، حزا، حزا، موم، مو | Spignel, Bold- money, Wild anethum | شویتە کێویلە، گیایەکە گوڵەکەی لە شێوی چەتر دایە. |
| شبت | Demodicida | مێروویەکی بچوکە لەژێر سەلکی مووی پێستدا دەژی، دەبێت هۆی خورو. |
| شبث، رتيلاء، طرنطلة | Galeodes, Tarantula | جاڵجاڵۆکە گەورە، جۆرێکی ژەهرینە لە جاڵجاڵۆکە، ڕەنگکەی زەردە، لە دەشتو دەردا دەژی. |
| شبثان | Geophilus | ( جیوفیلەس) گیاندارێکی دڕندەیە، لە هەزار پێی دەچێت بەشەو ڕووناکی دەداتەوە. |
| شبح، خيال | Ghost, Specture | تارمایی، بەبانی، تاپوو، ساو، ساوێر. |
| شبح الحرب | War cloud | تارمایی شەڕ، هەوری شەڕ. |
| شبحية عدسة، ايجابية، (شيئية) | Objective | زەڕەبینی شت، ئەو زەڕەبینەی کە بەرامبەر شتەکە دادەنرێت بۆ گەورەکردنی لە میکرۆسکۆبدا. |

| | | |
|---|---|---|
| شبدع، شبدهة | Yellow scorpion | دووپشکە زەردە،، دووپشکێکی گەورە یان مامناوەندییە ڕەنگەکەی زەردە. |
| شبذر، نفل | Clover | سێپەڕە، وێنجە، گیایەکە بۆ لەوەڕ باشە. |
| شبر | Handpan, span, palm | بست، مست، قولانج ،بۆست، بهۆست، نۆئینج، ئەندازەی درێژی بەینی پەنجە گەورەو پەنجەی شایەتمان (دۆشاومژە) بە مەرجێك ناو لەپ تەواو کرابێتەوە. |
| شبرق | Schipperke | (سکیپێرکی) سەگێکی بچووکی ڕەشی بێکلکە. |
| شبرق | Young cat | بەچکە پشیلە. |
| شبرق | | بڕوانە (شبارق، تین القدماء) . |
| شبرقة | | مەسرەفی گیرفان. |
| شبريص | Young camel | بەچکە وشتر. |
| شبرم، شرنب، بوش ريح | | شیرمارە کێویلە، جۆرێکە، لە ڕووەکی شیرمار، ژەهراوییە، گوڵەکەی شینە. |
| شبشب، خف | Mule, slipper | سۆڵ، پانی بەرز. |
| شبشب السيدة | Ladys slipper | سۆڵی خانم، جۆرە ڕووەکێکە گوڵێکی جوانی هەیە. |
| شبط الغول، بطباط، جنجر عصا الراعي | Knot, grass, Knot weed, Armstrong | گۆچانی شوان، گیاگرێ، گیایەکی دەشتەکی گوڵ وردە پزیشکییە، بەرەکەی قۆچەکییە چۆلەکە دەیخوات. |
| شبطر، خاتم سليمان [1] | Polydesmus, Millipede | تەتەڵەمیران، جۆرە گیاندارێکە، ڕەشە لە هەزار پێ دەچێت، لەشی لە (٢٠) پارچە پێکهاتووە، لەناو باخچەو کێڵگەدا دەژی، خۆی وەکوو ئەمووستیلە خڕ دەکات. |
| شبعان | Full, Satisfied | تێر، تێروتەسەل، تەسەل. |
| شبع | Fullness, satisfaction Satiety | تێری ، تەسەلی. |
| شبق شهواني | Lustful, Lecherous, Lididinous | ئالۆشاوی، حەشەری، بەتەڵەب. |
| شبق، نزو، اغتلام، غلمة، ودقان، شرة النكاح | Erocticism, satyriasis, Libido, Sexual appetite, Gyneco mania, Lust, Edeomania, Estromania, Nymphomania Aphrodisia, Lescivia, orgasm, Estrus, Estrum | ئالۆشی ڕەگەزیی، حەشەرێتی ، ئارەزووی جووتکردن، خرووی ڕەگەزیی، خرۆشی ڕەگەزی، هۆك، دۆڵەبەبا، بە بەران، لە ماییندا، بە تەڵەب، لە بزندا تەگە، لە مانگادا بەکەڵی کەڵی کەڵەگا. |
| شبق ايلامي | Algolagnia | ئالۆشی ڕەگەزی بە ئازار، حەشەرێتی بە ئازاردانەوە، ئالۆشێکی ڕەگەزی نائاساییە بەرامبەری بدات لە کاتی جووت گرتندا. |
| شبق الفرس | Heat period | بە تەڵەبی ماین. |
| شبق الرسوم، غلمة الصور شبق نفساني | Inconolagny pcycholagny | ئالۆشی وێنە، حەشەرێتی وێنە، ئالۆشی سەیرکردنی وێنەی ڕووت ئالۆشی دەروونی ، حەشەرێتی دەروونی. |
| شبق الأنثى | Nymphomania | حەشەرێتی مێ، ئالۆشی مێ. |
| شبك، شبق، غليون المدخنين | Pipe | سەبیل، دارجگەرە، قەلینی، سەبیلی تووتن، تووتن یان جگەرە کیچشان. |
| شبك طويل، شبق طويل | Chibouk, Chibouque | سەبیلی درێژ، هەندێك جار مەترو نیوێك دەبێت. |
| شبكة | Net, Rete, reticala, lattice | تۆڕ، داو، داف، تەڵە. |
| شبكة الصيد الحشرات | Netnylon | تۆڕی مێرووگرتن. |

| | | |
|---|---|---|
| شبكة | Netreticulum | تۆڕ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشوورییە. |
| شبكة الصيد | String | تۆڕی ماسی. |
| شبكة الحياة | Survivalnet | تۆڕی ژیان. |
| شبكة النجاة، شبكة الأنقاذ | Lifenet | تۆڕی رزگاربوون، وەکوو لە کاتی ئاگر بەربوونەوەدا بەکاردێت. |
| شبكة عظمية | Cancellus | تۆڕی ئێسکی، ئێسکێك لە شێوەی تۆڕدا. |
| شبكة كروماتينية | Chromatin net<br>Chromatin reticulum | تۆڕی کرۆماتینی، لەناو ناوکی خانەی زیندەوەردا هەیە. |
| شبكة اندوبلازمية | Endoplasmic Reticulum | تۆڕی ئیندۆپلازمی، بریتیە لە سایتۆپلازمی خانەی زیندەوەر کە بە شێوەی جۆگەڵەی باریکی بە یەکەوە ئاڵاو لە نێوانی پەردەی پلازما و پەردەی ناوکدا هەیە. |
| شبكة الغذاء | Food web | تۆڕی خۆراك، پەیوەندی خۆراکی لەنێوان زیندەوەرەکاندا. |
| شبكة معدنية | Metallic net | تۆڕی کانزایی، تەلی کانزا، تەلی کانزایی. |
| شبكة سلكية | Wire gauze | تۆڕی تەل، دەخرێتە سەر سێپا لەژێر قاپوکەمۆڵەدا بۆ مەبەستی گەرمکردن لە تاقیگەکاندا. |
| شبكة عجيبة | Retemirabile conjugatum | تۆڕەسەیرە، بریتییە لە تۆڕێك لە دەزوولەی خوێنین، پەیوەندیی هەیە بە تورەکەی گازی لەشی ناو ماسییەوە. |
| شبكة عصبية | Neurospongium | تۆڕی دەماری. |
| شبكة منوية | Spermatic rete | تۆڕی سپێرمی. |
| شبكة حوضية، ضفيرة حوضية | Pelvic plexus | پرچی سێبەندەیی، تۆپەڵە دەمارێکە لەشێوەی پرچدا لە ناوچە سێبەندەدا، |
| شبكة نووية | Nucleoreticulum<br>Nuclear-network | تۆڕی ناوکی، تۆڕی ناو ناوکی خانە. |
| شبكة مالبيجي | Rete of malpighi | تۆڕی مالپیجی لە پێستدا. |
| شبكم البحر، لاميناريا | Sea tangle, laminaria | تۆڕی دەریا، لامیناریا جۆرە قەوزەیەکی دەریاییە. |
| شبكة الترع | Canal system | تۆڕی جۆگە،، بۆ ئاودانی زەوی. |
| شبكة العين | Retina, ophthymen | تۆڕینەوەی چاو، تۆڕی چاو چینی ناوەوەی چاو کە وێنەی شتومەکی لەسەر چاپ دەبێت. |
| شبكيات الأجنحة | Raphidoptera | باڵتۆڕییەکان، جۆرە مێروویەکن. |
| شبكي | Retial, Reticulate, Reticular | تۆڕیی، شتێك پەیوەندی بە تۆڕەوە هەبێت. |
| شبكي الشكل | Retiform | شێوە تۆڕی، هەرشتێك لە شێوەی تۆڕدا بێت. |
| شبل | Younglion, Lional cub, whelp | ژێر کوڵ، شێرکۆ، تێشکاشێری. |
| شبلية | Chablis | (شابلی) جۆرێکە لە شەرابی فەرەنسی. |
| شبن | Fattening | قەڵەوکردن، ئالیکدان بە ئاژەڵ بۆ مەبەستی قەڵەو کردنیان. |
| شبنم، كزور | CassoWary | مریشکی چینی، باڵندەیەکە لە وشترمر دەچێت، بەلام بچووکترەو پۆپینەی هەیەو نافڕێت. |
| شبه جزيرة | Peninsula, Chersones | نیمچە دوورگە، نیودوورگە، کەرکە. |
| شبه موصل | Semi-conductor | نیمچە گەیێنەر، ئەو مادانەی کە نیمچە گەیێنەرن بۆ کارەبا. |
| شبه الدودو | Vermian | نیمچەکردن. |
| شبه قارة | Semi-continent | نیمچە کیشوەر. |

| | | |
|---|---|---|
| شبه، شبيه | Like- Similar to, Resemble | لێچوون، نیمچه، وەکوو یەك. |
| شبه الزورق | Scaphoid | نیمچه بەلەم، شێوه بەلەمی. |
| شبه معلق | Suspensiod | نیمچه گیرساوه، مادەیەکی ملیی گیرساوه یان یان مادەیەکی مله دەنکۆڵەی رەقی گیرساوەی له شله تیادایه. |
| شبه دائري | Semicircular | نیمچه بازنەیی. |
| شبه الظلام | Semidarkness | نیمچه تاریکی. |
| شبه جلوف | Semidrying | نیمچه وشك، کزر. |
| شبه مائع | Semi liquid | نیمچه شل. |
| شبه كروي | Semiglobal | نیمچه خڕۆك. |
| شبه رطب | Semimoist | نیمچه شێدار. |
| شبه الصيني | Semiporcelain | نیمچه فەخفوری، جۆرێکی نیمچه باشه له فەخفوری. |
| شبه صلب | Semisolid | نیمچه رەق. |
| شبه كرمة، كرمبة | Ampelopsis | نیمچه مێو، مێوۆکە رووەکێکی کەپرییه له داری مێو دەچێت بۆ مەبەستی رازاندنەوه بەکاردێت. |
| شبه مستحلب، مستحلباني، مستحلب | Semiemulsifier, Colloidalemulsion | نیمچه شیراووگ. |
| شبه شفاف | Translucent, Semitransparent | نیمچه روون، وەکوو شووشەی نیمچه روون. |
| شبه منحرف | Trapezoid | قەناس، شەفتول، نیمچه لاکێشە، نیمچه لادەر، سێگۆشە، کەل. |
| شبه، شبهات، نحاس اصفر | Brass, Latten | براس، شەوگ، زەرد، پرنج، ئاڵتوونی درۆزنه، دارشتەی مس، مسی زەرد. |
| شبه الزنبقي | Semilily | نیمچه زەمەق، گیاندارێکی دەریاییيه له شلێر دەچێت. |
| شبه جاف | Semi arid | نیمچه وشك. |
| شبه قلوي، قلواني شبقلي | AlKaloid | (ئەلکالوید)، نیمچه ئەلکالی، ئاوێتەیەکی ئۆرگانکیه( ئەندامی‌یه)، لەگەڵ ترشەڵۆکەکاندا یەك دەگرێت و خوێ پەیدا دەکات، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت وەکوو کۆکایین و کنین. |
| شبه جذر، جذراني | Rhizoid | نیمچه رەگ، وەکو رەگی کەڕوو که رووەکەکه جێگیر دەکات و خواردەمەنی بۆ هەڵدەمژێت. |
| شبه فلز، فلزاني | Metalloid | نیمچه میتاڵ، نیمچه کانزا، وەکوو زەرنیق. |
| شبه سم | Toxoid | نیمچه ژەهر، ژەهرینه، به مادەی کیمیایی چارەکراوه بۆ ئەوەی ئەنجامێکی ترسناك نەدات، بەڵام بەشێوەی دەرمان بەکار دەهێنرێت. |
| شبه زلال | Albuminiod | نیمچه پرۆتین، جۆره مادەیەکه له پرۆتین دەچێت ناتوێتەوه زۆر بەرهەڵستی کارلێکی کیمیایی دەکات. |
| شبه الظل، ظل الناقص | Penumbra | نیمچه سێبەر، قەراغی سێبەر، که کەمێك روناکتره وەك له بەشی ناوەراست. |
| شبه جزيئي، ايزمر | Isomer | لێکچووی مۆلیکیولی، لێکچووی گەردیی. |
| شبه غضروفي | Subcartilaginous | نیمچه کرکراگەی. |
| شبه الخلية | Celliod, Cyroid | نیمچەخانه. |
| شبه دهني | Lipoid | نیمچه چەوری. |
| شبهان، صامورفاليورس، شوكة المسيح | Paliurus, christs thorn | درکی مەسیح دارو دەوەنێکی درکاوییه له تاوگ (نبق) دەچێت، گوڵەکەی زەردە، بەرەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شبه ناضح، نصف ناضح | Semi-permiable | نیمچە دەلێنەر، وەکوو پەردەی نیمچە دەلێنەر کە لە رەگۆلەکانی رووەکدا هەیە. |
| شبوي، منثور، خيري | Annual-stock, Malthiola | شەوبۆ، گیایەکە بە تۆو دەچێنرێ، گەڵای وەکوو گەڵای بیە، گوڵێکی زەردی بۆنخۆشی هەیە لە شەواندا بۆن دەداتەوە. |
| شبوي شجري | Night queen, Night- Blooming, Jassamine | شەوبۆی درەخت، یاسەمینی شەو. |
| شبوي اصفر، منثور اصفر | Alpine-wall Flower | شەوبۆی گوڵزەرد. |
| شبوة | Chelifer | دووپشکە درۆزنە، گەنگە دووپشک، جۆرە مێروویەکە لە دووپشک دەچێت. |
| شبوط، سابوت، بطريخ | Chup, Carp, Barbus- grypus | قاشنە، قاشەماسی، سوورەماسی، ماسییەکی رووباری سەر بچووکی ناوقەد پانە. |
| شبوبية | Adolescence | هەرزەکاری، جحێڵی تەمەنی نێوان ١٤-٢٥ ساڵ. |
| شبوب | Adult | خرت، بەچکە ئاژەڵ ئەگەر هەراش بێت. |
| شبور، بوق، نفير | Bugle, horn, Shopar, Trumpet | شەیپور، زورنا. |
| شبورة، ضباب | Fog, Thickmist | تەم، تەمێکی سووکەڵەی رۆش کە بۆ ماوەی هەزار مەتر شتوومەکی تیادا ببینرێت. |
| شبيط، ارقطيون | Cocklebur | گیایەکی درکاوی دەشتەکییە گوڵەکەی بەشێوەی هێشووە بۆ مەبەستی پزیشکی بۆ چارەکردنی نەخۆشی پێست بەکاردێت. |
| شبينة، اشبينة العروس | Bridesmaid, best maid | بەربووک، بەربیک. |
| شبيق صنبور | | قامیشی سەبیلو نێرگەلە. |
| شبيدع | Young, scorpion | بەچکەدووپشک، تیشکادیپشکی. |
| شبيه الأنسان | Anthropoid | نیمچە مرۆڤ، هەر مەیمونێک کە لە مرۆڤ بچێت وەکوو کیپۆنو شەمپازیو مرۆڤی دارستان. |
| شبيرو، مكتير | Jabriu | (جابیرو)، جۆرێکە لە حاجی لەق لەق دەنووکی ئەستوورە، کلکی کورتە. |
| شبيك | Amaryllis | (ئەماریلیس)،گیایەکی سلکدارە لە کۆمەڵەی نێرگز گوڵی زۆر جوان دەگرێت. |
| شت، شتات | Dispersed, scattered | وردەشت. |
| شتات العقل، سروح العقل | Rhembasmus | خەیاڵ رۆیشتن، داڵغەلێدان. |
| شتاء | Winter | زستان، زڤستان، جستان، زوسان. |
| شتائي | Hibernal | زستانە. |
| شتال | Late rice | جۆرە ورنجێکە چاندنەکەی دوا کەوتبێت. |
| شتر | Eversion, ecstrophy, Ectropion, Ectropium, Extrophy | هەڵگەراو. |
| شتن الجفن الداخلي | Biepharelosisentropion | هەڵگەرانەوەی لێواری پێڵوو بۆ دیوی ناوەوە. |
| شتر لبجفن الخارجي | Ectopion, Ectropion, Ectropium | هەڵگەرانەوەی لێواری پێڵوو بۆ دیوی دەرەوە. |
| شترة | Space between two fingers | بۆشایی نێوان دوو پەنجە. |
| شتراق مخزني، حشيشة الذهب | Scale-fern-Scaly -wort- Rusty-back | گیازێڕ، رووەکێکە لە کۆمەڵەی سەرخس (گیادارو) لە شوێنی شێدارو ناو بەردەڵانیدا دەژی، رەنگێکی ئاڵتوونی لێ دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شتل، شتلة | Slip, Transplant-Nursery-plant-seedling-Sapling | شەتڵ، نەمام، درەختێکی ساوا بە ریشەوە هەڵکەندار بێ بۆ ئەوەی لە شوێنێکی تردا بنێژرێت بۆ سەوزبوون. |
| شتوي | Wintery-Hibernal, Hiemalis, brumal, Hiemal | زستانی، جستانی، زمستانی. |
| شتيت، شاش | Gauze | شاش. |
| شت، شغالة | Working-bee | هەنگی کارەکەر، کارەکەری هەنگ، پاڵە. |
| شثن، جسأ، غلظ، غلاظة، صخن | Pachyblepharon, Pachybiepharosis | ئەستوریی پێڵوو ئەستوربوونی پێڵوو. |
| شثنيات | Pachyderms | پێست ئەستوورەکان، کۆمەڵە گیاندارێکی شیردەری سمداری ناکاوێژکەری پێست ئەستووره وەك فیلو وولاخ. |
| شثن الشفتين | Pachychilia | لچ ئەستووری، لیڤ ستیر. |
| شثن الجلد | Pachyderma, pachydermia | پێست ئەستووریی. |
| شثن الدم، تكثف الدم | Pachyemia | خوێن خەستبوونەوە، خەست بوونەوەی خوێن. |
| شثن اللسان، سماكة اللسان | Pachyglossia | زمان ئەستووریی، ئەستوربوونی زمان. |
| شجاع | Brave | نەبەرد، نەوەرد، لێهاتوو، بوێر، دلێر، ئازا، نەبەز،گیانداری چالاکی ئازا، دلاوەر، خورت، گەرناس. |
| شجاع، اربد، افعوان | Python, puffadder | (پایشـــۆن)، مارێکی سەرزلی ملباریکە، لە کاتی توورەبووندا خۆی فوو دەدات. |
| شجاع، ثعبان البحر | Hydra, sea serpent | ئازا، ماری دەریا، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشوورییە. |
| شجاعة | Courage,Bravery | ئازایەتی، ئازایی، نەبەردی، دلاوەری. |
| شجاب، شجب، غدان، وتد، مشجب، شماعة الملابس | Ciotshrail, Cloths hook | عەلاگەی جل، سنگی جل، سنگی جل هەڵواسین. |
| شجار، ترباس | Door bolt | سورگی. سورگی دەرگا. |
| شجار، نقالة الجرحى | Stretcher | سەدەیەی گواستنەوەی بریندارو نەخۆش. |
| شجارة | Dendrology | زانیاری دارو درەخت. |
| شجة | Skull-fracture | شکان لە کەللەی سەردا. |
| شجة، برغوث الرمل النقاب | Jigger,Chigoe, sand flea | جۆرێکە لە کێچی لم. |
| شجران | Shagreen | (شاگرین)، جۆرێکە لە چەرم. |
| شجرة | Tree, Arbor | دار، درەخت، رووەکێکی تەواوە لە قەدەکەی تەختەیییە، کۆمەڵەکەی پێی دەگوترێت بێشە یان دارستان، دوو جۆرە درەخت هەیە:- هەمیشە سەوز وەکوو سنەوبەر، گەڵاوەریو وەکوو توو. |
| شجرة الكلب اليسم ذهبي | Golden ruft,Gold dust, Rock alysson | دارسەگ، ئەلیسەمی زێڕی، گیایەکە گوڵی زەردی جوان دەگرێت. |
| شجرة المسافر، رونالا، راڤاناله | Ravenala | (راڤاناله)، درەختێکە لە دارخورما دەچێت لە دوورگەی مەدەغشقەر دەڕوێت. |
| شجرة عابر السبيل، وبورنوم ، جحليق | Viburnum, way farer tree | داری رێبوار، دەوەنێکە گوڵەکەی بەشێوەی هێشووی سپییە، بەرەکەی بە شێوەی هێشوی شینە، گەلێك جۆر دەرمانی لێ دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شجرة المخيط، سبستان، مخاطة، اطباء الكلبة، بنبر، بنبار، مقساس | Sebesten, Cordia- myxa | بنبەر، بنبار، گوانی سەگ، درەختێکە لە ئاسیا دەڕوێت، بەرێکی لینجی هەیە، دەخورێت پێی دەوترێت، سنجسبویە)هەروەها دەکرێتە ترشیاتەوە. |
| شجرة اللؤلؤ | Pearl tree | دارمراوی، دەوەنێکە گوڵەکەی سپیی بەرینە، بەرەکەی پێنج سووچە لە بەلەم دەچێت. |
| شجرة الجوز المسهل | Candle-nut tree Tung Oil tree | گوێزرەوانی، دارێکە لە کۆمەڵـەی شیرمار، بەرەکەی چەورە رۆنێکی لێ دەردەهێنرێت بۆ درەستکردنی وەرنیش. |
| شجرة جوفاء | Pumped tree | داری ناو بۆش، درەختی کلۆر، درەختێك ناوەکەی کلۆربێت. |
| شجرة صبغ الأناتو، بكسا،، ارناتو، شجرة الحمرة | Annattoodye plant, Arnotto tree, Arnatto, Bixa, Annotto | دار سووراو، دەوەنێکی دەشتەکی‌یە،گوڵێکی زەرد دەگرێت،بەرەکەی توکنە رەنگێکی سووری لێ دەردەهێنرێت بۆ بۆیەکردنی فەخفوری بەکاردێت. |
| شجرة الدبق، شرابة الراعي | Bird lime tree | دار دەمووکانە، درەختێکی بەرزە گەڵاکەی هەمیشە سەوزو ددانداری تیژە، گوڵەکەی سپییە بەرەکەی وەك ترێ وایە، رنگێکی پەمبەیی هەیە ، ژەهرە. |
| شجرة الرفتنج، رانتجية، | Picea, spruce | دارڕانج، دارڕێسن، درەختی رازاندنەوەیە لە کۆمەڵەی سنەوبەر. |
| شجرة الزورق، زورقية | Angophora | داربەلەم، درەختێکە لە کۆمەڵەی مۆرد، بەرەکەی شێوەیەکی بەلەمی هەیە، بۆ رازاندنەوەیە بەکاردێت. |
| شجرة الفضة | Protea, protea argent | زۆتیا، دارزیو، دەوەنێکە بۆ رازاندنەوە بەکاردێت. |
| شجرة المحامي، افوكادو، شجرة التمساح، زبدية | Avocado-tree, Alligator pear | داری پارێزەر،ئەڤۆکادۆ، درەختێکی ناوچە گەرمەکانە، بەرمکەی لە هەرمێ دەچێت. |
| شجرة الشاي الأحمر | Red tea tree, Mnuka myrttaceous tree | دارچایی سوور. |
| شجرة النير، نيرية | Horn beam, carpi nus | دارتەوق، درەختێکە لە کۆمەڵەی بەڕوو تەختەکەی قورس‌و قایمە، تەوقی ملی گاجووتی لێ درووست دەکرێت. |
| شجرة الحقور | Pignut | گوێزەبەران، درەختێکی ئەمریکییە جرە گوێزێك دەگرێت. |
| شجرة السرو السوداء | BlacK cypress | سەرووی رەش، گەڵاو تۆوەکەی بۆ لەرزوتاو نەخۆشی جگەر باشە. |
| شجرة السمرة | Acacla | ئەکاکی، دارجەوی. |
| شجرة عملاقة، سيكويا، جبارة الخشب الأحمر | Sequola, Bastard tree Red wood | (سیکۆیا) تەختەسوورە، سووردار، درەختێکە زۆر بەرزو ئەستوورە لە کۆمەڵـەی سنەوبەر هەندێك جار بەرزییەکەی دەگاتە (١٠٠) مەتر، تەختەکەی بە نرخە. |
| شجرة خبز القرود، باوباب، بوباب، تبلدي، شجرة القرع | Baobab, Monkey-bread | دارکولەکە، نانمەیموون، درەختێکی مەزنە بەرەکەی هێلکەیی‌یە، هێندەی پرتەقاڵێك دەبێت، ترش دەێت، ترش‌و تفتە، تەختەکەی نەرمە. |
| شجرة التانغ | Tung-tree | درەختی تانگ، درەختێکە لە چین دەڕوێت، رۆنی تانگی لێ دەردەهێنرێت. |
| شجرة تين المعابد | Pogoda tree, peepul tree, pipul tree, pipal tree | هەنجیری پەرستگا، درەختێکە لە هەنجیری بەنگال دەچێت، رەگی لاوەکیی هەیە. |
| شجرة الكبراشو | Quebrcho | (کویبراشۆ) درەختێکە تەختەکەی پتەوە، توێکڵەکەی بۆ دەباخکردن بەکاردێت. |
| شجرة عيد الميلاد | Christmas tree, Pohutukawa | درەختی جێژنی کریسمس، هەر درەختێك قوچەك هەڵگر وەکوو سنەوبەر کە برازێنرێتەوەو بکرێت بە نیشانەیەك بۆ جەژنی کریسمس( سەری ساڵ). |

| | | |
|---|---|---|
| شجرة السيجار، شجرة قوفية | Cigar tree | درەختی جگەرە،درەختێکە پەڕەی گوڵەکەی لە جگەرە دەچێت، لە مەکسیك دەڕوێت. |
| شجرة البلاذر، شجرة الكاشيو، تفاح الأكاجو | Chashew | داری کاشیوو، درەختێکە لە کۆمەڵەی قەزوان، بەرەکەی پێی دوگوترێت سێوی ئەکاجو، دەخورێت، ناوگەکەی دەکرێت بە مەی جۆرە زەمقێك لە قەدەکەی دەردەهێنرێت لە پیشەسازیدا بەکاردێت. |
| شجرة التونا، مهاغوني هندي | Toon, Toona, Indian- mahogany | درەختی تونا، درەختێکی هەمیشە سەوزە، رنگ لە گوڵەکەی دەردەهێنرێت ، تەختەکەی بە نرخە، کەلوپەلی ناومالّی لێ دروست دەکرێت. |
| شجرة القندلية | Kandelia | (کاندیلیا)، درەختێکی هیندیە، توێکڵە وشکەکەی لەگەڵ زەنجەفیل و بیبەرو گوڵاو تێکەڵ دەکرێت بۆ چارەکردنی نەخۆشی شەکر. |
| شجرة الحديد | Siderodendron | دارئاسن، درەختێکە تەختەکەی زۆر رەقە. |
| شجرة الغبيراء، البيضاء | White beam tree | درەختێکە لە کۆمەڵەی هەڵووژە، تەختەکەی رەقە کەلوپەلی جوونی لێ دروست دەکرێت. |
| شجرة بلوط البرتغال، شجرة العفص،شجرة ملول | Portuguese Oak, Gall Oak | دارمازو، جۆرێکە لە داری بەڕوو، مازوو دەگرێت کە بۆ دەباخکردن بەکاردێت. |
| شجرة الزنبق، شجرة التوليب | Tulip-tree Lyre-tree saddle-tree Yellow poplar | درەختی زەمەق، شنارە زەردە، درەختێکە گەڵاکەی گەورەیەو گوڵەکەی گەورەو بۆنخۆشە، لە گوڵی زەمەق دەچێت تەختەکەی سووك و بە نرخەبۆ رازاندنەوەی باخچەکان بکاردێت. |
| شجرة الحمى، شجرة الصمغ الأزرق، يوكاليبتوس، كالبتوس | Eucalyptus tree , Blue gum tree | یۆکالیبتۆس، درەختێکی مەزنە بۆ پەرژین دەڕوێنرێت، هەروەها مادەی (یۆکالیپتۆل) پزیشکی لێ دەردەهێنرێت. |
| شجرة السجريق، خزريق، زمزريق، ارجوان، ارجوان العرب | Red bud, judas tree Love tree | ئەرخەوان، ئەرژینگ، گوڵی دڵداری، درەختێکە توێکڵەکەی دژی رەوانی بەکاردێت، ئەم درەختە پێش گەڵاکردنی گوڵ دەدات، گوڵەکەی ئەرخەوانی‌یە. |
| شجرة الصمغ الأسود | Black gum tree, Black snag tree | دارزەمقی رەش. |
| شجرة القنينة | Lecythis, Monkey pot tree | داربوتڵ، درەختێکە لە کۆمەڵەی مۆرد، برەکەی لە بوتڵ دەچێت بۆ رازاندنەوە بەکاردێت. |
| شجرة الورد | Rhododendron | دارگوڵەباخ، دارودەوەنێکە گوڵی زەنگوڵەی بەشێوەی هێشوو دەگرێت. |
| شجرة مريم، كف مريم، بخور مريم، عرطنيثا، سكوكع، دويك الجبل | Cyclamen | لەپی مریەم، گیایەکی تەمەن درێژی دەشتەکی‌یە گوڵێکی جوان دەگرێت لە کۆتایی زستاندا گوڵ دەگرێت. |
| شجرة الحياة الشرقية، ثويا شرقية، عفصية | Thuya arborvitae thyuya orientalis | سەرووی مازوو، سویای خۆرهەلاتی داری ژیان، جۆرێکە لە داری سەروو، بەرەکەی لە مازوو دەچێت، بۆ مەبەستی رازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت. |
| شجرة الحياة، المخيخ | Arborvitea of cere-belli | درەختی ژیان واتە مێشکۆلە کە بەشێکە لە مێشك. |
| شجرة الزجاجة | Bottle tree | دارشووشە، داربوتڵ، درەختێکی سەیرە قەدەکەی لە بوتڵ دەچێت لە باکووری ئوستورالیا دەڕوێت. |
| شجرة الشحم | Chinese tallow tree, Vegetable tallow | دارپیو، جۆرە درەختێکە روونێکی رووەکی لێ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی خواردەمەنی بەکاردێت. |
| شجرة مريم، كركاش | Feverfew Chrysant thennlum | گیایەکی دەشتەکیی بۆنخۆشە گوڵەکەی زەردە یان سپی‌یە. |

| | | |
|---|---|---|
| شجرة اليمام | Sunflower | گوڵەبەڕۆژە. |
| شجرة البن | Coffee tree | داری قاوە، درەختێکی هەمیشە سەوزە لە ناوچە گەرمەکاندا دەڕوێتبەرەکەی بەشێوەی دەنکی سەوزە، دەهاردرێتو لە ئاودا دەکوڵێنرێتو دەخورێتەوە بۆ وریاکردنەوە باشە. |
| شجرة المرجان | Coral tree | دارشیلان، درەختێکە گەڵاکەی جوانو رەنگ شیلانییە. |
| شجرة المرجان | Clove tree | دارمێخەك، دەوەنێکە لە کۆمەڵەی مۆرد، لە ناوچە گەرمەکاندادەڕوێنرێت لەبەر بۆنە خۆشەکەی گوڵەکانی ، ئەو مێخەکە کە لە بازاڕدا دەفرۆشرێت، بریتییە لە گوڵەکەی پێش ئەوەی دەم بکاتەوە لە سێبەرداوشك دەرێتەوە ئنجا دەکرێت بە ملوانکە یان بە شێوەی بەهارات بەکاردێت. |
| شجرة السنا، شجرة السنى | Cassia tree | داری کاسیا داری سینا وەکوو داری سینەمەکی. |
| شجرة خيار شنبر شجرة الخرنوب الهندي | Cassia-fistula, Purging cassia | داری خەیار چەرمە، کرۆکی بەرەکەی بۆ رەوانکردن بەکاردێت. |
| شجرة السحلب | Orchid tree | دار سەعلەب، دەوەنێکی کەپرینە لە کۆمەڵەی بۆهینیا، گوڵەکەی ئەرخەوانییە بۆ مەبەستی رازاندنەوە بەکاردێت. |
| شجرة ذئبة، شجرة ذئبية | Wolf tree | دار گورگ، درەختێکی بەهێزی مەزنە درەختەکانی تری تەنیشتی خۆی دادەپۆشێتو زیانیان پێ دەگەیەنێت. |
| شجرة الحلتيت، انجذان | Asafoetida | گیایەکی پزیشکییە، گوڵەکەی زەردە، جۆرە زەمقێك لە قەدەکەی یان رەگەکەی دەردەهێنرێت دژی کۆڵنج بەکاردێت. |
| شجرة الكافور، شجرة الصمغ الأرزق | Camphor tree | درەختی کافور، درەختی زەمقی شین، جۆرێکە لە یۆکالیپتۆس لە ئاسیا دەڕوێت، کافوری لێ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی |
| شجرة العود، عود الهند، عود هندي | Indian Aloe tree, Agallochum, Aloes wood | داری عود، دارەبۆ، درەختێکە ئەگەر پارچەیەکی لێ بسووتێنرێت بۆنێکی خۆش دەدات. |
| شجرة البقس، شمشاد | Box wood, Buxus | درەختی شمشار، دارو دەوەنێکە تەختەکەی زۆر رەقە، پەیکەرو شتی جوانی لێ دروست دەکرێت. |
| شجرة القرانيا | Dog wood, cornurs, Cornel | دار سەگ، دارو دەوەنێکی بەردارە، بۆ رازاندنەوە بەکار دەهێنرێت، گەلێك جۆری هەیە. |
| شجرة البلقاء، شجرة الكاجيبوت، شجرة شاي المنافع | Punk tree, cajupet Tree, swamp tea tree | داری کاجیبوت، درەختێکە لە کۆمەڵەی مۆرد گەلێك جۆری هەیە بۆ مەبەستی پزیشکیو رازاندنەوە بەکاردێت. |
| شجرة هوفينية، حلوة الثمر | Japanes raisin tree Raisin Hovenia | داری هۆڤینیای بەرخۆش، درەختێکە، بۆ رازاندنەوە ، لاسکی گوڵەکەی تامی مێوژ دەدات. |
| شجرة الأثل، شجرة الطفا، شجرة الملح | Atheltamarix, salt tree ,myrica, tammarisk | دارگەز، جۆرێکە لە دارگەز بەشی خوارەوەی قەدەکەی بەخوێ داپۆشراوە، بەرەکەی سوورە. |
| شجرة اللبخ، شجرة الحرير، ذقن الباشا، سنط اسطبول | Albizzia lebbek, Womans tongue tree, acacia lebbek | دارنوێنەك، دار ئاوریشم، جۆرێکە لە داری ئەکاکی. |
| شجرة الياسمين الهندي، شجرة الياسمين الأحمر | Nosegay tree Red jasmine | یاسەمەنی سوور، دەوەنێکە لە کۆمەڵەی زەیتون رۆنی یاسەمەن لە گوڵەکەی دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شجرة جوزة الوسم | Marking nut tree | درەختی گوێزی نیشانە، جۆرە مەرەکەبێکی لێ دەردەهێنرێت بۆ نیشانەکردنی قوماشی کەتان. |
| شجرة الرهبان، شجرة راهبية | Clerodendron | دارڕەبەن، دارو دەوەنێکی رازاندنەوەیە، ڕەبەنەکان (راهب) لەکاتی نوێژکردندا بە کاری دەهێنن. |
| شجرة المن، شجرة المران، شجرة الدردار، شجرة لسان العصفور | Ash tree | دارەڕەش، دارتۆفانە، درەختێکی شۆرەکات، لەزەوی شۆرەکاتدا دەڕوێت. |
| شجرة السبحة، شجرة الصين، شجرة مرة، ازدرخت، زنزلخت، جرود، شجرة سم السمك | Margosa, azedarach, Indian Lilac, Bead tree, China tree, China berry tree | دارتەزبیح، درەختی ژەهرەماسی، ئازاد درەخت، داری ئازاد، مەرگەماسی، درەختێك لە باخچەکاندا دەڕوێنرێت، دەنکی بەرەکەی تەزبیح و ملوانکەی لێ دروست دەکرێت. |
| شجرة ابي مالك، اشنان | Salt wort | ئەسپۆن، زوری، گیایەکە بەرەکەی بچووکە، ئەسپۆنی لێ دەردەهێنرێت، وەکوو سابوون کەف دەکات. |
| شجرة البلانيرة | Pianera tree, water elm | دارەڕەشی ئاوی، داری تۆفانەی ئاوی،دارو دەوەنێکە بۆ مەبەستی رازاندنەوە دەڕوێنرێت. |
| شجرة الدلبة، صنار | Piane tree, Oriental plane tree, platanus | دارچنار، درەختێکە نزیکە، (٣٠) مەتر بەرزدەبێتەوە گەڵاکەی لەشێوەی دڵدایە لە قەراغ ئاودا دەڕوێت بۆ دارەڕای خانوو بەکاردێت. |
| شجرة حجرية سوداء الثمر | Crow berry | تووترك، دەوەنێکی دڕکاوییە، بەرەکەی لە توو دەچێت بچووك و رەشە دەخورێت. |
| شجرة الكاذي | Screw pine | درەختێکی ناوچە گەرمەکانە، قەدەکەی باریکە، لە قەدی دارخورما دەچێت. |
| شجرة بونسيانة | Poinciana | پۆنسیانا، درەختێکی رازاندنەوەیە. |
| شجرة العقد، شجرة عقدية | Ormosia | دار ملوانکە، درەختێکی رازاندنەوەیە تووەکەی دەکرێت بە ملوانکە. |
| شجرة البق، اولم، دردار، بوقيصا، غرغار، غرغاج | Eim tree | داروزم، دارتۆفانە، دار مێشوولە، نارەوەن، بوز، بەوز، دارگوژم، داری بناو، بناف، دارەڕەش، رەشەدار، قەرەقاج،درەختێکە قەراغی گەڵاکەی ددانـدارە، گەڵاکەی تورەکەی پێوەیە ئاوێکی تیایە بۆ مەبەستی پاکژکردنەوەی برین و شتنی چاوی نیشاو بەکاردێت. |
| شجرة السنديان | Oak tree | داری بەڕوو. |
| شجرة النسب، شجرة العائلة | Genealogical-tree Diphyletic tree | سەجەرە، سەرجەڵەی خێزانی، سەرجەڵەی ڕەچەڵەك، سەرجەڵەی ژیان. |
| شجرة الجندب | Locust tree | خرنووك، خرنوێك. |
| شجرة المقل، دوم | Doum palm | دارخورمای دۆم، درەختێکە لە کۆمەڵەی دارخورما ، قەدەکەی لقاویە، جۆرە دۆشاوێك لە بەرەکەی دەردەهێنرێت. |
| شجرة الأرالية الشائكة برتقال بري | Angelica tree Aralia spinosa, Wild orange | داری ددان ئێشە، پرتەقاڵە کێویلە، دەوەنێکە بەرەکەی لە ترێ دەچێت بۆ مەبەستی پزیشکی بکاردێت. |
| شجرة الحماض | Sorrel, tree sour wood | دارترشۆکە، درەختێکە گەڵاکەی ترشە گوڵەکەی سپییە، تونکڵ و گەڵاکەی رەنگی رەشی پێ دەکرێت. |
| شجرة مثمرة | Fruitful tree | درەختی بەردار، داری بەردار. |
| شجرة التامول تنبل، تنبول، شاه صيني | Betel, Betel peper | داری بێتێل، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی بیبەر ، لە هیندستان گەڵاکەی دەجوون، بەرەکەی لە گوێز دەچێت رەنگێکی سووری لێ دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شجرة القدس، اسطر غالوس، عنزروت، قداد، كثيرا، حلوسيا، قتاد الصمغ، مخلب العقاب | Astrgalos, Milk vetch | رووەکێکی کەتیرە، کۆمەڵە گیاو دەوەنێکی دەشتەکی‌یە، گوڵەکەی بەشێوەی مێشوویەکی سپی یان زەرد یان بنەوشەیی یان سورە، بۆ مەبەستی پزیشکی یان دەرهێنانی کەتیرە بەکاردێت، نزیکەی (٤٠) جۆریان هەیە. |
| شجرة اللوتس، شجرة اللطس، نيلوفر | Lotus tree | درەختی لۆتس، لیلۆپەر، جۆرە گیاو دەوەنێکە گەڵاکەی لە پەڕ دەچێت، بەرێکی سەیری هەیە، گوڵەکەی زەرد یان ئەرخەوانی یان سپییە. |
| شجرة الدم، شانجار، شنجار، رجل الحمام، حنو الغول، خس الحمار، لسان الثور، الكحلاء، الصباغي ، حميراء | | زمانەگای رەنگگردن، رووەکێکی دەشتەکی‌یە رەنگی سوور لە رەگەکەی دەردەهێنرێت. |
| شجرة الفوفل، اريكا كوثل | Areca-catechu | (ناوکلیا)، دارخورمای ئەریکا، جۆرە دارخورمایەکە لە ئاسیا دەڕوێت تونکڵەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| شجرة البان، بان، يسر، يسار، شوع، مورنجة، سياع | Moringa, Ben, Benne | موورونچە، درەختێکە لە ناوچە گەرمەکاندا دەڕوێت وەکوو لە سیلان گوڵەکەی بۆنخۆشە، دەنکەکەی رەش و بۆنخۆشە و دەکرێت بە تەزبیح، هەروەها رۆنی (بێنی) لێ دەردەهێنرێ بۆ دروستکردنی عەتر بەکاردێت. |
| شجرة السماء، شجرة الله | Cinese Ash tree, Tree of God tree of heaven, Ailan Thus, Copal tree | داری ئاسمان، داری خودا، درەختێکی بەرزو گەورەیە بۆ مەبەستی رازاندنەوەی شەقامەکان دەڕوێنرێت، راتنجێکی بۆنخۆشی لێ دەردەهێنرێت. |
| شجرة البيتولا، سندر، شجرة القان، تامول، شجرة القضبان، شجرة البتول | Birch, Betula | تێرو، درەختێکە لە دەوەنی بەڵاوك دەچێت، تونکڵەکەی رۆنێکی عەتری لێ دەردەهێنرێت، هەروەها قترانێکی لێ دەردەهێنرێت بۆ نەخۆشی پێست. |
| شجرة الأبنوس، ساسم | Ebony | درەختی ئەبەنۆس، درەختێکی گەڵا پانە، رۆنێکی لە رەگەکەی دەردەهێنرێت گویا بۆ دژی رووتانەوەی تووکی سەر باشە، تەختەکەی رەق و رەش و بەنرخە. |
| شجرة لسان الطير، شجرة الجنة، سماق صيني | Ash tree Tree of heaven | درەختی زمانە چۆلەکە، درەختی خودایی، درختی بەهەشت، درەختێکە مادەیەکی راتنجی لێ دەردەهێنرێت. |
| شجرة الجميز، سقوم، سوقم | Mulbery fig, sycamore fig, Sycamore | توورهەنجیر، هەنجیرەتوو، درەختێکە لە باشووری شام و میسر دەڕوێت تەختەکەی قایمە، بەرەکەی دەخورێت. |
| شجرة الدلب الغربي، قيقب دلبي كاذب | Plane tree, falsesycomore, platan, Sycamoremaple, Acer | دارچناری خۆرئاوایی. |
| شجرة الأرز، شربين عرعر | Cedar | درەختی عەرعەر، هەڤریسك، جۆرە درەختێکی گەورەی جوانە لە کۆمەڵەی کاژ (سنەوبەر). |
| شجرة الخبز، جاكا، زامية الكفر | Bread tree , Bread fruit tree, jack tree, Coonite tree jamaica Sago, Zamia | (١) دارەنان، درەختی نان، درەختێکە بەرەکەی لە کاڵەك دەچێت، سەوزو قاش قاشە، کرۆکەکەی سپی‌یەو گەورەیە، ناوکی برەکەی نیشاستەیە، دەخورێت یان دەکرێت بە نان و چێشت. (٢) درەختێکە لە کۆمەڵەی سایکاس قەدەکەی ئەستوورو بێ لقە لە تەپلە سەرەکەیدا تۆپەڵێك گەڵای پێوەیە لە شێوەی پەڕدا جۆرە نیشاستەیەکی لێ دەردەهێنرێت. |
| شجرة الدكن، نبق مسهل، قرن الظبي | Buck thorn | تاووگی، رەوانکەر، بەرەکەی رەشە، کاکڵەکەی بنەوشەیی‌یە، بەرەکەی بۆ مەبەستی دەرمانی ئاژەڵ بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شجرة الشمع، شمعية، شجرة، جوْزة المسهل | Beeberry, candle berry-myrtle, wax myrtle | دارمۆم، دارو دەوەنێکە گوڵەکەی سەوزو بچووکە، بەرەکەی وردو رەنگ باینجانییە، مادەی مۆم لە گەڵاو برەکەی دەردەهێنرێت. |
| شجرة ، نخبة | Elite tree | دارپسند، دار هەڵبژاردە، ئەو درەختەی کە پەسەند، دەکرێت بۆ زیادکردنی رواندن، لەبەر چاکیی تووەکەی یان قەڵەمەکەی یان برالەکەی یان لەبەر ئەوەی کە خێرا گەورە دەبێت، یان جوانیی شێوەکەی یان چاکیی تەختەکەی یان لەبەر ئەوەی کە بەرهەڵستی کاری ئاوو هەوای خراپ دەکات یان بەرهەڵستی مێروو دەکات. |
| شجرة الدخان، سماق الصباعين | Smoke tree | داردووکەڵ، جۆرێکە لە داری سماق. |
| شجرة الزنبق | Tulip tree | درەختی زەمەق، درەختێکی گوڵدارە. |
| شجرة المظلة | Umbrella tree | دارچەتر، جۆرێکە لەو درەختی ماگنولیا. |
| شجرة الورنيش، شجرة البرنيق، شجرة اللك | Varnish tree Lacquer tree | داروەرنیش، دارلۆك، درەختێکی ئاوکێکی رێسینی زەمقی دەردەدات، لۆکی لێ دروست دەکرێت، لە یابان و بۆرما دەروێت. |
| شجرة القطلب، قاتل أبيه | Straw berry tree, Caneapple | درەختی تووترك، دەوەنێکە بەرەکەی لە شلیك دەچێت. |
| شجرة التمساح، شجرة الميعة السائلة | Alligator tree, Sweet gum Liquid ambar | دارتیمساح، درەختێکی جوانە زەمقێکی رێسینی بۆنخۆش دەردەدات بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| شجرة الشبرق، ضريع | Ononis , spinosa | درەختێکی درکاوییە. |
| شجرة الكرنبية | Angeteen tree, Cabbage tree | دار کەلەرەم، درەختێکە دەرمانی کرم لە توێکڵەکەی دەردەهێنرێت.شجره المکاگ، هیفیه، کاوتشوك، شجره الدموع. |
| شجرة المطاط، هيفية، كاوتشوك، شجرة الدموع | Hevea, caoucthouc- tree, Rubber tree, Si phoonia | درەختی هیفیا، درەختی فرمێسك، درەختی لاستیك، درەختێکی هەمیشە سەوزە نزیکەی (٤٠) مەتر بەرز دەبێتەوە لە ناوچە گەرمەکاندا ، دەروێ گەڵاکەی مەیلەو سوورە، لوولی خواردووەسێ پەلکی هەیە، شیراوەکەی لاستیکی لێ دروست دەکرێت. |
| شجرة الختمة، شجرة الخطمية | Shrub Althaea, Ketmia tree | درەختی هێرۆ، دەوەنێکە بۆ رازاندنەوە بەکار دەهێنرێت، گوڵەکانی لەگوڵی هێرۆ دەچێت، گەلێ جۆری هەیە، گوڵی سوور یان ئەرخەوانی یان سپی یان پەمەی دەگرن. |
| شجرة السمن، غبيراء الحابلين، دردار جبلي | Mountain ash, Rowan Rowan berry, sorbus | دارمەڕشە، کێویلە، درەختێکە گەڵاکەی ناوێتەیە، بۆنی گوڵەکەی بۆگەنە، بەرەکەی وردو ترش و تفتو خڕو ئەرخەوانییە، لە سێو دەچێت بۆ دروستکردنی مەی بکاردێت. |
| شجرة الصابون، ريتة | Soap nut tree Soap berry tree | داری سابوون، درەختێکە بەرەکەی لە ترێ دەچێت ریشاڵو گەڵا و بەرەکەی مادەیەکی تیایە وەکوو سابوون کەف دەکات. |
| شجرة الجرح، مسيس، تبغ غلوكا | Nicotiana-glauca | توتنە کێویلە، جۆرێکە لە رووەکی تووتن، گوڵەکەی زەردە، بەرەکەی وردو خڕو قاوەییە، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| شجرو الحمص، هرشان كبير | Cargana | (کارگانا)، دەوەنێکە گوڵەکەی ئاڵتوونییە بەرەکەی لە نۆك دەچێت، دەخورێت. |
| شجرة الزبدة، باسية السمن | Bassia-butyr-acea | باسیای کەرە، درەختێکی ناوچە گەرمەکانە، گوڵەکەی زەرد یان سوورە، رۆنێکی تامخۆش لە تۆوەکەی دەردەهێنرێت. |
| شجرة العطر | Hedyosmon | (هیدیۆزمۆن)، درەختێکە لە خۆرئاوای هیندستان دەروێت، گەڵاکە بۆ نەخۆشی سەرئێشەو هەرسکردن باشە. |
| شجرة العرب، قيقب حقلي | Birds tongue, Maple tree | درەختی عەرەبی، درەختی زمانە باڵندە، گوڵەکەی سەوزە. |

| | | |
|---|---|---|
| شجرو الحية، شجرة السرو | Cypress | سەروو، داری سەروو. |
| شجرة الطلحة | Acacia aegypyptiaca | ئەکاسیای میسری، درەختێکە لە بیاباندا دەڕوێت، جۆرێکە لە داری ئەکاکی جەوی دەردەدات.. |
| شجرة العسل | Honey tree, Wavy-leafed,Tecomella | دار هەنگوین، درەختێکی جوانە بۆ رازاندنەوە ، گەڵاکانی دەوەرێن و لقەکانی خوارو خێچن ، گەڵاکەی سەوزی مەیلەو خۆڵەمێشی و تووکنە، گوڵەکەی بێ بۆنە لە فنجان دەچێت، بە رەنگی زەردو پرتەقاڵی، کەڵك لە تەختەکەی وەردەگیرێت. |
| شجرة الفلفل الكاذب | Peruvian-mastic tree, False pepper | بیبەرەدرۆزنە، دەوەنێکە لە کۆمەڵەی قەزوان، گەڵاکەی سەوزە بەرەکەی سوورە، بۆنی بیبەری لێدێت، بۆ رازاندنەوە دەڕوێنرێت. |
| شجرة الفلفل، فلفل الزينة، شكينوس | Pepper tree, Schinus | درەختی بیبەر، بیبەری رازاندنەوە، درەختێکی هەمیشە سەوزە بەرەکەی لە بیبەر دەچێت، بەشێوەی هێشووە نزیکەی (٥-٦) مەتر بەرز دەبێتەوە، مادەیەکی رێسینی تیادایە گەڵاکەی لە پەڕی باڵندە دەچێت. |
| شجرة القثاء، شجرة الخيار، شجرة مغنوليا الخيار | Cucumber tree, Mag nolia | ماگنولیا، خەیار، جۆرە درەختێکی ئەمریکی‌یە بەرەکەی لە خەیارێکی بچووك دەچێت. |
| شجرة تريمو، أدينم، عدن | Adenium | (ئەدینەم)، درەختێکی ژەهریـنی دەشتەکی‌یە لە ناوچە بەردەلانیەکاندا دەڕوێت، رەنگی قەدەکەی جیوەییە، گەڵاکانی ژەهرینە. |
| شجرة الصناعة | Industry tree | درەختی پیشەسازی، ئەو درەختانەی کە بۆ مەبەستی پیشەسازی بەکار دەمێنرێن، وەکوو درەختی لاستیك، گوێزی هیندی، کینیا . هتد. |
| شجرة صمغ التنين، شجرة دم الأخوين، توز مخزني، قاطر | Dragon gum tree | بەقەم، درەختی خوێنی دوو براکە، درەختی ئەژدیها، درەختێکی ناوچە گەرمەکانە ، گوڵەکەی سپی مەیلەو زەردە، لەسەر لووتکەی شاخ دەڕوێت، ئەگەر توێکڵەکەی بریندار بکرێت، مادەیەکی لینجی سووری لێ دێتە دەرەوە، بە شێنەیی ئەو مادەیە وشك دەبێتەوەو دەبێت بە پارچەیەکی سووری خاو. |
| شجرة التنين، التنينية | Dracaena | درەختی ئەژدیها، درەختێکە لە کۆمەڵەی زەمەق لە دارخورما دەچێت هەندێکی گوڵەکەی سپی بۆنخۆشەو هەندێکی ئەرخەوانییە، بۆ رازاندنەوە بەکاردێت. |
| شجرة الأيدع، دم التنين | | درەختی خوێنی ئەژدیها، درەختێکە بۆ رازاندنەوە بەکاردێت، ئاوگێکی زەمقی سوور لە قەدەکەی دەمێنرێت، لە دروستکردنی وەرنیشدا بەکاردێت. |
| شجرة القدس، شجرة نوارس | Small goats Thorn | داری قودس، رووەکێکی دەشتەکی پزیشکی‌یە دەرمانی لێ دەردەهێنرێت دژی ژانەسك و کرم. |
| شجرة الفواكه، شجرة مثمرة | Fruit tree, Fruiter | درەختی میوە، ئەو درەختانەی کە سود لە میوەکان وەردەگیرێت وەکوو سێو و پرتەقاڵ . هتد. |
| شجرة السمك، شجرة الصين، شجرة مرة، ازدرخت، زنزلخت، جرود | | بڕوان ( شجره البحه). |
| شجرة الكبد، بلدس | Boldo, wood tree | داری جگەر، درەختێکە گەڵاکەی بۆنخۆش و پزیشکییە، دەرمانی لێ دەردەهێنرێت، بۆ نەخۆشیی جگەر، برەکەی لە گوێز دەچێت، دەخورێت. |
| شجرة العضاة، شجرة العضة | Thorny tree Haw thorn | گوێژە کێویلە، درەختی دڕکاویی. |
| شجرة السواك، شجرة المسواك، شجرة الأراك، شجرة الحيزران | Tooth brush tree, Bamboo | (١) داری سیواك، داری ددان، ئاژنین، بامبوو، تەرگەز، حەیزەران، بەرەکەی بەشێوەی هێشووە ترێیە.<br>(٢) دەوەنێکە گوڵەکەی بۆرە، بەرەکەی زەردە لە ترێ دەچێت، دەخورێت، لقەکانی بۆنخۆشە، سیواکی پێ دەکرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شجرة النض | Ice, mos, snow-linchen | قەوزەی سەهۆڵ، جۆرێکە لە قەوزە. |
| شجرة الأس، ريحان القبور، حيلاس، ياس | Myrtle, myrtus | مۆرد، مۆرت، یاس، دەوەنێکە گەڵاکەی هەمیشە سەوزە، گوڵێکی سپی بۆنخۆش دەگرێت، بەرەکەی پێی دەگوترێت دەنکی مۆرت، شیرین و تفتە، دەخورێت. لقەکانی بۆ گۆڕستان بەکاردێت. |
| شجرة السوس، عرقوس،، سوس | Ijquorice-plant, Lic orice, sweet root | بەلەك، گیایەکی تەمەن درێژە، لاسکەکەی رەقە، رەگی درێژی هەیە، پێی دەگوترێت بنەبەلەك، دەهارێت و شەربەتی لێ دروست دەکرێت یان بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| شجرة العتم، زيتون بري | Wild oilve tree | زەیتوونە کێویلە، سرێنچك، جۆرێکی کێویلەیە لە زەیتوون. |
| شجرة البابيا، شجرة البباز، بباظ | Papaw, papaya | (پاپایا)، (پاپاو)، جرە درەختێکە، بەرەکەی دەخورێت، جۆرێکی تری هەیە تۆوەکەی رشێنەرەوەیە. |
| شجرة الجنة،شجرة الفردوس | Heaven tree | درەختی بەهەشت، جۆرە درەختێکە توێکڵەکەی تاڵ و رشێنەرەوەیە. |
| شجرة الواك، أبو تيلون، أبو طيلون | Indian mallow, Yellow- mallow, Abutilon | تۆڵەکەی هیندی، دەوەنێکە بۆ رازاندنەوە، ریشاڵی توێکڵەکەی چنراوی گوشی لێ دروست دەکرێت. |
| شجرة الصندل | Sandal wood, santalum | داری سندەڵ، داری سەنەڵ، درەختێکە قەدەکەی سوورێکی کاڵە، تەختەکەی قایم و بۆنخۆشە، رنگێکی سووری مەیلەو شەرابی لە تەختەکەی دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی، گەلێك جۆری هەیە وەکوو سەنەڵی سوورو سەنەڵی زەردو سەنەڵی سپی. |
| شجرة كف مريم، شجرة الكف | Rose of jercho, | دار لەپ، رووەکێکی ساڵانەی دەشتەکییە، کە پێ دەگات وشك دەبێت، بە هەڵی دەکەنێت و دەیبات لەگەڵ خۆی ئەگەر لە شوێنێکی شێداردا گیرسایەوە دەڕوێتەوە. |
| شجرة الجرب ، سماقل، سماق، تمتم، عبرت، عربرب، عترب، عنزب | Sumach, sumac | داری سماق، درەختێکە لە کۆمەڵەی قەزوان ، بەرەکەی بە شێوەی هێشوویەکی سەوز لە دواییدا سوور دەبێت، بەشێوەی ترش و بەهارات بەکاردێت، گەڵاکانی بۆ مەبەستی دەباخی و رەنگکردن بەکاردێن. |
| شجرة بلسم بيرو | Peru-baisam tree | درەختی بەلسەمی پیرۆ، بەلسەمێکی لێ دەردەهێنرێت، دەرمانی کۆکەی لێ دروست دەکرێت. |
| شجرة البلسان، شجرة البلسم، شجرة البكا، | Balm, Balsam tre-Myroxylon | درەختی بەلەسان، درەختی بەلسەم درەختێکە توێکڵەکەی بۆ ڕەوانی بەکار دەهێنرێت ، هەروەها مادەیەکی رێسینی بۆنخۆشی لێدەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی. |
| شجرة اللبن | Cow tree, Milk tree | دارمانگا، دارشیر،درەختێکە ئەگەر قەدەکەی برینداربکرێت، شیراوێکی لێ دێتە دەرەوە دەخورێتەوە یان دەکرێت بە پەنیر. |
| شجرة السندروس، شجرة الأرار، شجرة العرعر | Sandarac tree, Arar tree | دار سەندەروس، هەڤرێسك، عەرعەر، درەختێکی مەزنە لە کۆمەڵەی سنەوبەر ، رێسینێکی سپی رۆشنی لێ دەردەهێنرێت. |
| شجرة التزيين | Ornamental-tree | درەختی رازاندنەوە. |
| شجرة التربنتين، شجرة البطم، الحبة الخضراء، شجرة العلك، شجرة الضراوة | Terbebinth-tree Terpentine-tree | داری تەربیتین، دارەبەن، دارەوەن، دارقەزوان، داربەمك، دار بینوشمە، درەختێکی جوانی بۆنخۆشە، مادەی بنێشتی لێ دەردەهێنرێت، بەرەکەی بەشێوەی هێشوویەکی سەوزە، فەریکی یان پێگەیشتوویی دەخورێت. |
| شجرة البرقوق، اجاص البر | Spondias, Hagplum tree | بەلالوك، هەڵوژە کێویلە، درەختێکی ناوچە گەرمەکانە بەرەکەی بۆنخۆشە دەخورێت، بۆ بووژاندنەوەو رەوانی بەکار دەهێنرێت، گەڵاکەی بۆ ئارەق کردنەوەو رەنگ و توێکڵەکەی بۆ قەبزکردن بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شجرة الساج، دلب هندي | Eeast Indian tree, Teak tree | درەختی ساج، تەختەکەی رەقە، کەشتیی لێ درووست دەکرێت، گەڵاو تۆوەکەی بۆ میزپێکردن بەکار دەهێنرێت. |
| شجرة الكاكاو، شجرة، شجرة الشكولاتة، شجرة لوز الهند | Cacaolate tree Chocolate tree | درەختی شیکۆلاتە، درەختێکە کاکاو لە بەرەکەی دەردەهێنرێت. |
| شجرة الجراد، روبنياسنطية، سنط كاذب، شجرة الخروب | Locuts tree, false acacia, Rubinea- pseudocacla | درەختی کوللە، گەندە ئەکاسیا، ئەکاسیای درۆزنە، درەختێکی ژەهرینە، بەرەکەی لە کوللە دەچێت توێکڵەکەی رشێنەرەوەیەو رەوانکەرە، گوڵەکەی سپییە، کرۆکەکەی شیرینە، دەنکەکەی قاوەیی، دژی کۆڵنج بەکار دەهێنرێت. |
| شجرة القات، شاي العرب | Kat, Khat, Cafta | قات، درەختێکی هەمیشە سەوزە، گوڵەکەی سەوزی مەیلەو زەردە، بەرەکەی ترش و تفتە،مادەیەکی سرکەری تیایە، وەك لە بەنگو تلیاکدا بۆ سرکردن بەکار دەهێنرێت، لە هەندێك شوێن گەڵاکەی دەجوون چونکە وریاکەرەوەیە. |
| شجرة الفلين، سنديان الفلين، بهش، بلوط الفلين | Cork oak, Cork tree | درەختی تەپەدۆر، بەرووی تەپەدۆر، جۆرێکە لە درەختی بەروو تەپەدۆر لە توێکڵەکەی دەردەهێنرێت. |
| شجرة خرافية، شجرة الوقواق، شجرة البزاز، البرازية، طرطور | Stinging Banterefoil, sterculia | داری پیسایی، دارگوو، درەختێکی دەشتەکییە بۆ رازاندنەوە بەکاردێت هەرچەندە بۆنێکی پیسی لێدێت. |
| شجرة الطاعة، ميموزا، مستحية | Mimosa, Sensitive-plant | (میمۆسا)، رووەکی شەرمن، دارو دەوەنێکە گەڵاکەی لە پەڕ دەچێت، ئەگەر دەستی لێ بدرێت خۆی لوول دەکات، گوڵەکەی لە گوڵە گەنم دەچێت گوڵی وردو سپی یان زەرد یان پەمبەیی دەگرێت. |
| شجرة النيلة | Indigo plant | رووەکی چوویت، رەنگی چویت لە گەڵاو قەدەکەی دەردەهێنرێت. |
| شجرة المصطكا، بطم شرقي، ضرو | Mastic tree, Lentiscus | دارەبەن، درەختی مەستەکی، دەوەنێکە لە کۆمەڵەی قەزوان، بنێشتی مەستەکی لێ دەردەهێنرێت. |
| شجرة الجهنم شجرة الجحيم، خلاف، شجرة السقر صفصاف سوحر | WillOW | داربی، درەختی زەقووم، درەختێکە لە قەراغ ئاودا دەروێت، گەڵا و رۆنەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| شجرة ابراهيم، ارثد سرساد | Chaste tree, Hemp tree, Abrahams balm | داری گوش، داری داوێن پاکی، داربرایم، پێنج ئەنگوست، دەوەنێکی پزیشکییە گوڵی شین و بۆنخۆش دەگرێت، بەرەکەی لە دەنکی دەلوبیبەر دەچێت، پێی دەگوترێت دەنکی ونکردن، گوایا خواردنی دەبێتە هۆی ونکردنی ئارەزووی رەگەزی و وەجاخکوێری. |
| شجرة الأثداء، جباس، ممية، مشمش امريكية | Mammea, mamey, mamme apple | قەیسی ئەمریکی، درەختێکی بەردارە گوڵەکەی بۆنخۆشە، بەرەکەی خڕو گۆشتن و زەردە دەخورێت، دەرمان لە توێکڵەکەی دروست دەکرێت. |
| شجرة الحندقوق، شجرة النفل | Trefoil, tree, shubby trefoil, Hop tree | دارکنێر، دار سێپەرە، درەختێکی بۆنخۆشی کوێستانییە، دارەکەی لە داری بایەف دەچێت. |
| شجرة الأشق، دوروم | Dorema | (دۆریما)، رووەکێکی پزیشکی دەشتەکییە، زەمقی ئامۆنیاکی لێ دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی کۆڵنج و نەخۆشیی دەمار، گوڵەکەی سپی و مەیلەو زەردە. |
| شجرة البخت، بختيةالرهبان | Glory tree, Cierodendron | داری بەخت، دارو دەوەنێکە لە هیندستان زۆرە، لە کاتی نوێژکردندا تەختەکەی دەسوتێنن. |

| | | |
|---|---|---|
| شجرة الدينار، شجرة الجنجل | Hop tree | درەختی دینار، داردینار، گیایەکی تەمەن درێژە گەڵاکەی سێ پەلکە ، گوڵەکەی سەوزی مەیلەو سپییە، دەکرێتە خواردنەوەی بیرەوە بۆ بۆنخۆشکردنی بەرەکەی لە بەری دارەڕەش دەچێت، دەخورێت. |
| شجرة البهاء | Callodendron | دارەشۆخە، درەختێکی جوانە بۆ مەبەستی رازاندنەوە بەکاردێت. |
| شجرة الملائكة | Angel tree | پارزی، درەختێکە گەڵاکەی لە هی زەیتون دەچێت، گوڵێکی زەردی بچوك دەگرێت. |
| شجرة الثلج، شجرة الدميك | Purification tree | داربەفر، رووەکێکی سەلکدارە، لە کۆمەڵەی نێرگز. |
| شجرة الجن، ارز هملايا، ارز الهند | Himalayan Cedar, Devdara, Deodar cedar | دێودار، درەختێکی مەزنە، لە کۆمەڵەی کاژ (سنەوبەر) گەڵاکەی لە برژانك دەچێت. |
| شجرة الحرير، صقلاب سوري، لبخ سنط اسطنبول | Silk wood, Silk cotton, Aibizzia-julibrissin | (ئەلبیزیا)، داری ئاوریشم، دەوەنێکە گوڵەکەی زەردی مەیلەو سەوزە، رەنگی بەرەکەی فستقیە، ریشاڵی ئاوریشمی سپی تیایە، دەنکەکەی رەشە. |
| شجرة الزقوم، شجرة الأهليلج | Zachun oil | درەختی زەقوم، درەختی هەلیکە لە ئەفریقیا دەڕوێت رۆنی هەلیلە لە تۆوەکەی دەردەهێنرێت. |
| شجرة لسان العصفور، مران دردار | Ash tree, Fraxinus | درەختی زمانە چکۆلە، درەختێکی رازاندنەوەیە،گوڵەکەی سپی یان فستقیە، بەرەکەی لە باڵ دەچێت، گەڵاو توێکڵەکەی دەرمانی پزیشکی لێ‌دەردەهێنرێت. |
| شجرة الحور، قوغ، اسفندار | Poplar | داری چام،سپی چنار، سپیدار. |
| شجرة الساغو، ساغوتية، نخل النشا | Sago palm | دارخورمای نشاستە، جۆرێکە لە دارخوما مادەیەکی نیشاستە لە کرۆکی قەدەکەی دەردەهێنرێت پێی دەگوترێت ساگۆ، دەخورێت. |
| شجرة الميعة اسطرك، عنبر دماع، لبني، لبني، جاوي | Storax satin, Walnut tree, styrax, gum-benjamin tree | زەمقی جاوە، درەختێکە گوڵەکەی زەردی مەیلەو زەردە، مادەیەکی عەبەری واتا زەمقێکی رێسینی بۆنخۆشی پزیشکی لە قلیشاندنی قەدو لقەکەی دەگیرێت بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| شجرة النبق، سدر، نبق المسيح، شوكة المسيح | Nabko, Christthorn, Nabk | تاوك، درکی مەسیح، درەختێکی درکاویە بەرەکەی لە گوێز دەچێت، شیرین و تفتە. |
| شجرة ثلاثية، ليمون الصين | Trimphasia | لیمۆی چینی، دار سێپەلکۆکە، دارێکە لە کۆمەڵەی پرتەقاڵ گوڵەکەی سێ پەلکە. |
| شجرة الحراب، حرابية | Celastrus, Staff tree | دارسونگی، درەختێکی رازاندنەوەیە جاران یۆنانییەکان سونگییان لە لقەکانی دروست دەکرد. |
| شجرة الغابات، شجرة الحراج | Forest tree | داری بارستان، وەکوو داری گازو و سەروو و هەڤرێسکو بەروو . هتد. |
| شجرة القابوق، شجرة القطن الكاذب، شجرة القطن الحريري | Kapok, Silk cotton , ceiba, Bom bax | درەختی کاپۆك، ، درەختی لۆکە درۆزنە، درەختی لۆکەی ئاوریشمی، درەختێکی مەزنە بەرەکەی مووی ئاوریشمی پێوەیە. |
| شجرة الكينا، السنكونا | Cinchona, quinquina | داری کینا، داری سینکۆنا، درەختێکە دەرمانی کنین، کە بۆ چارەکردنی لەرزوتا بەکاردێت، لە توێکڵەکەی دەردەهێنرێت. |
| شجرة الأثاب شجرة البنغال، شجرة البانيان | Banyan tree, banina, Moraceous tree | هەنجیری بەنگال، داری دانیان، ئاوکەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| شجرة المكانس | Broom tree | دارگەسك، درەختێکە لقەکانی دەکرێن بە گەسك. |

| | | |
|---|---|---|
| شجرة القرفة | Cinnamon tree | دارچینی، درەختێکە لە چین و سیلان و سایگۆن دەڕوێت، توێکڵەکەی باشترین جۆری دارچینیە. |
| شجرة هدبية، شجرقمهدبة | Fringe tree | درەختی ڕێشودار، درەختێکی ڕازاندنەوەیە گوڵەکەی بەشێوەی ڕێشووی سپییە، توێکڵی ڕەگەکەی دەرمانی میزپێکردنی لێ دەردەهێنرێت. |
| شجرة المعبد، جينكو، جنكة، معبلة | Ginkgo, Gingko, Ginko, maidenhair tree | جینکۆ، درەختی دڵداری، درەختێکی گەورەیە لە کۆمەڵەی سنەوبەر بەرەکەی شێوەی بادەمیی زەردو چەورە، دەخورێت، گەڵاکەی لە باوەشێن دەچێت. |
| شجري | Arboreal, Arborous, Dendroid Dendritic | درەختیی، شتێك پەیوەندی بە درەختەوە هەبێت. |
| شجري الشكل | Dendriform | درەخت، شێوە شتێك لەشێوەی درەختدا بێت. |
| شجر، كوسي، كوسا | Vegetable marrow, Gourd, squash | کولند، کودی، کولەکەی درێژکۆلە. |
| شجر اسكلة | PumpKin, Red-gourd, Winter squash | کولەکەی سوور، کولندی زەر. |
| شجرة المغزل | Spnidle tree | درەختی تەشی، دەوەنێکە گوڵ و بەرەکەی چوار پارچەیە، کە بەرەکەی پێ دەگات شەق دەبات و دەنکێکی پرتەقاڵی لێ دێتە دەرەوە. |
| شجعم، عفريت، شيطان | Devil, Demon | دێو، درنج، ئەرژەنگ. |
| شجيرة ، جنبة | Shrub | دەوەن، داڵی شەخەڵ، بنچك، درەختیلە، دەڤی. |
| شجيرة اللؤلؤ | Pearl bush | دەوەنی مرواری، دەوەنێکە گوڵەکەی سپی بەفرینە، بەرەکەی پێنج سووچە لە بەلەم دەچێت. |
| شجير، كثير الشجر | Wooded | دارستان، شوێنێك درەختی زۆربێت. |
| شح البول | Oliguria | میزکەمی، کەمی میز. |
| شحاذ العين، شعيرة ظفري، دمل الجفن، ودقة | Stye, Stigh, Sty, Hordeoium, Chalazion | سیکچە سڵاوە، قنچکە سڵاوە، دگدگە، پەیدابوونی زیپکە لە بنکی برژانگدا بەهۆی ئاوسانی لووی چەوری لە پێڵووی چاودا. |
| شحام | Adiposis, Lipossiss, Lipidosis | قەڵەوی. |
| شحاج، شحيج، نهيق الحمار | Bray of an ass | زەڕینی کەر. |
| شحاح ، اخدري | Onager, Wildass | کەرەکێوی. |
| شحار، سحلب، خصي | Salep,saled, Lizard | سەعلەم، ڕووەکێکە سەلکەکەی دەرمانی لێ دروست دەکرێت، بۆ بەهێزکردنی دەمار. |
| شحاطة | Sole | سۆل، نەعل، کاڵە، شمك، پاپوچ. |
| شحان تربيني | Turbosuper-charger | بارگەکەری تۆربینی، مەکینەی جوڵێنەر. |
| شحاذ متسول | Begger | پارسەك، دۆزەکەر، سواڵکەر. |
| شحب | Stubble ploughing | نیمچەکێلان، تەنها ڕووی زەوی بۆ دەرهێنانی پاشماوەی کشتوکاڵی دورراوە. |
| شحة | Littleness, Smallness | کەمی. |
| شحذ، سن | To whet, Sharpening | ساون، تیژکردن، دەمەزەردکردن، وەکوو تیژکردنی چەقۆ. |
| شحرور، شحور، زرزور | Biack bird | ڕیشۆلە، هەزار داستان، سوێروو، سێروو، شالول،، شاوو، گاوانی، ڕەشۆلە،باڵندەیەکی ڕەشی کونج کونجە،لە چۆلەکە گەورەترە، دەنگی خۆشە، دەنووکی ڕەشە. |

| | | |
|---|---|---|
| شحرورمطوق | Ring ousel | ریشۆڵەی تەوقدار، ریشۆڵەیەکە بەر سنگی سپییە. |
| شحص | Mock-privet | زەیتونە درۆزنە، دەوەنێکی رازاندنەوەیە لە کۆمەڵەی زەیتون، بەرەکەی لە ترێ دەچێت، رەنگەکەی بنەوشەیی مەیلەو رەشە، تەختەکەی بە نرخە. |
| شحط ذرق الطائر | Dung | ریقنە، ریقنەی باڵندە. |
| شحط، رزح، دعم | Propping, Staking | چەقاندنی دار لە پەنا روومەکی لاوازدا بۆ ئەوەی خۆی بگرێت. |
| شحفل | Silverydiacope | دیاکۆپی زیوی، جۆرە ماسیەکە رەنگەکەی زیوییە دەخورێت. |
| شحك | Stemming of tobacco | وەچکردنی گەڵای توتن. |
| شحم، ودك | Suet, tallow, Grease, fat lipide Adeps | پیو، چەوری، بەز، رۆنی گیانەوەری. |
| شحم حيواني | Tallow | پیوی گیاندار، بەزی گیاندار. |
| شحم الخنزير | Lard, Adeps | بەزی بەراز. |
| شحم الغنم، شحم الصوف، لانولين | Lanolin | بەزی مەر، پیوی مەر، رۆنێکە لە خوری دیگیرێ بۆ دروستکردنی مەلحەم. |
| شحم البحر، قنديل البحر، رئة البحر، سمك هلامي، قريص البحر | Medusa, acaleph, sea nettle, sea blubber | میدۆزا، سیی دەریا، بەزی دەریا، گەزندەی دەریا، چرای دەریا، گیاندارێکی دەریایی جوانە. |
| شحم تزليق | Lubricatin-grease | (گریس) رۆنی مەکینە، تێکەڵاوێکە لە چەند جۆرێك لە سابوونە کانزاییەکان بە تێکەڵاوی لەگەڵ رۆنی کانزایی و روومەکی بۆ مەبەستی چەورکردنی مەکینە دژی ژەنگ و داخوران. |
| شحم الأمعاء | Tallow, Suet | بەزی ریخۆڵە، بەزی دەوری ریخۆڵەی گیاندارە کاوێژکەرەکان. |
| شحميات | lipids | پیوەکان، چەورییەکان، بەزەکان. |
| شحمي، شحماني | Adipose, Adipo, Greasiness Lipoid | بەزیی، پیویی، چەوریی. |
| شحمة العين، مقلة | Eye ball | بەزی چاو، گلێنەی چاو. |
| شحم الحوت | Biabber | پیوی نەهەنگ، بەزی نەهەنگ، ئەو بەزەی کە لە نێوان پێست و ماسوولکەی نەهەنگدایە. |
| شحمية الدم | Lipe mia | بەزی خوێن، بوونی چەوری لە خوێندا. |
| شحمة الأذن، حلمة الأذن | Ear Lobe, Bur, Lobe of the ear | وەڵەی گوێ، نەرمایی گوێ، پەرەی گوێ پەلکا گوهی. |
| شحمة الرمل | Hymenoptera | مێروویەکە باڵی وەك پەردە وایە. |
| شحمة المرج، خطمي، شحم المروج | Marsh-mallow | هێرۆ، هێلوو، گیایەکە نزیکەی مەترو نیوێك بەرز دەبێتەوە گوڵێکی گەورەی مۆریان پەمەیی دەگرێت، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| شحمة، جمارة، شحم النخلة | Palmite | جومار، کرۆکی دارخورما، گۆیکەی سەرە پۆپەی دارخورما، سپی و کەمێك شیرینە، دەخورێت. |
| شحمة الأرض،جوز جندم | Mango steen | گوێز گەنم، درەختێکە بەرەکەی دەخورێت. |
| شحمة الأرض، خرطون | Earth worm | کرمی زەوی، کرمێکی مەیلەو سووری لوولەیی باریکی سوود بەخشە لە زەویدا دەژی. |
| شحمة الأرض، كماة | Truffle | دوومەلان، رووەکێکە لە کۆمەڵەی قارچك لەچێر زەویدا دەروێت، بریتیە لە سەلکی خڕی گۆشتنی مەیلەو قاوەیی لە پەتاتە دەچێت، تامی خۆشە، دەکرێت بە چێشت. |

| | | |
|---|---|---|
| شحمية | Phytomonas-phase oil | نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە لە لۆبیاو فاسولیا دەداتو سیسی دەکات. |
| شحن | Filling, Charging, Loading | بارکردن، پڕکردن، بارگەکردن، باربەستن، بارگەبەستن، داگرتنەوە. |
| شحن البطاريات | Charging | پڕکردنەوەی پاتری، بارگەکردنەوەی پاتری. |
| شحن البندقية | To load agun | تێزکردن، داگرتنەوەی تفەنگ. |
| شحنة العمل و الأنتاج | Production- ration | ژەمەبار، ژەمەبەرهەم. |
| شحنة | Charge | بارگە، بار. |
| شحنة موجبة | Positive-charge | بارگەی موجەب، بارگەی گەرم. |
| شحنة سالبة | Negative-charge | بارگەی سالیب سارد. |
| شحنة كهربائية | | بارگەی کارەبایی. |
| شحوار ، نيلج | Lamp black, soot, Smut | رەش، مەنجەڵ تەنی. |
| شحوب | Cacoch roia | رەنگ زەرد بوون، رەنگ هەڵبزرکان. |
| شحوب يخضوري، شحوب كلوروفيلي | Chlorosis | هەڵبزرکانی سەوزینە، هەڵبزرکانی کلۆفیلی، نەخۆشی‌یەکی رووەکییە لە ئەنجامی کەمی هەندێك کانزای وەکوو ئاسنەوە. |
| شحوب ظلامي، تصفير | Etiolation | هەڵبزرکانی تاریکییانە، زەرد هەڵگەرانی رووەك، بە هۆی تاریکییەوە. |
| شحوة، خطوة | Stride | هەنگاو پێنگاف. |
| شحيح، قليل | Little, Shy producer | کەم. |
| شحيم، مشحن، سمين | Fat, Fatty | تەڵەو. |
| شحيمة، لاسحة، عث الورق | Silver worm | کرمە زیوی، مۆرانی کاغەز، جۆرە مێروویەکە لە هاری دەچێت، دوو قۆچی درێژی هەیە کلکی سێ فاقە. |
| شحيمية | Water wort, pipe wort | گیازوڕنا، گیایەکی ئاویی بچووکە. |
| شخ، شخاخ، بول | Urine | میز. |
| شخاب، حليب | Milk | شیر. |
| شخاط، شخاطة، كبريتة | Matches | شقارەتە، شقاڵتە، شەمچە، پێتك، چەمچە، دەرسك. |
| شخاطة امين | Safety matches | شقارتەی بێترس، ئەو جۆرە شقارتەیەیە کە هەتا دەنکەکەی لە قەراغی قووتوەکەی نەخشێنرێت گڕ ناگرێت. |
| شخاطة غير امين | Unsafety matches | شقارتەی بە ترس، ئەو جۆرە شقارتەیەیە کە دەنکەکەی بەر هەر شتێکی زبر بکەوێت گڕ دەگرێت. |
| شخب، قصيف | Procerus, Breakable | خاو، شتێك کە زوو واتا بە ئاسانی بشکێت. |
| شخت، حزمة حطب دقيق | Faggot | بارە چیلکە، تڕك. |
| شخطور، شختور، غندولة، جندول | Gondola | قەیك، بەلەمی درێژ. |
| شخدب | Stilbum | مێروویەکی شینی مەیلەو زەردە لە زەردەواڵە دەچێت. |
| شخرم | Pristipoma | (پریستیپوما)، جۆرە ماسییەکی دەریایی‌یە. |
| شخس | Limestone | بەردی قسڵی نەرم. |
| شخص، انسان | Person | کەس، زەلام، مرۆڤ. |
| شخصية | Personality | کەسێتی، کەسایەتی. |
| شخصية مزدوجة | Dual personality | کەسێتیی دوانی، جووت کەسێتی. |
| شخوص | Staring illness, gazing illness | وقوڕمان، تۆقین، زارەترەکێ، حەپەساویی، حەپەسان، نەخۆشی‌یەکی دەمارییە، ئەو کەسەی تووشی دەبێت دەسەلات ون دەکاتو ماسولکەکانی رەق دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شخورة، شيم | Caranx-rhonchus | (کارانکس)، جۆره ماسییەکە. |
| شخير | Snort, snoring | پرخە، پەخەپرخ، لرخە،لرخوو هوڕ، پرخو هوڕ، مشەمش، قەخەو پرخە. |
| شدادة، لولب شد | Turnbuckle | برغوی بەستن. |
| شداد | Tie | مورەداری ناو دیواری خانوو. |
| شدادة | Press | مەنگەنە، بەستە. |
| شدة عنف | Intensity | توندی، تین، زەبر، هێز، قایمی، قەیمی، بڕی، وزەی رووناکی یان کارەبایی یان دەنگ کە بە رووبەرێکی تایبەتیدا دەڕوات لە ماوەیەکی تایبەتیدا. |
| شدة الضعف، شدة الوهن | Hyperasthenia | بێ هێزییەکی بەتێن. |
| شدة توتر العين، غلوكوما، زرق الماء الأزرق | Gilaucoma | گلۆکۆما، ئاوی شین، نەخۆشی‌یەکە لە چاودا. |
| شدة الأستضاءة | Intensity of illumination | تینی رووناکی دانەوە، زەبری رووناکی دانەوە، بڕی ئەو رووناکی‌یەی کە لە رووی مادەیەکەوە دەدرێتەوە. |
| شدة الصوت | Intensity of sound, Loudness | تینی دەنگ، زەبری دەنگ. |
| شدة سفيفة | Cradle rope, Cradle line | دەسرازە، ئەو پەتەی کە منداڵی ساوای پێ دەبەسترێت لە بێشکەدا. |
| شدة الظما، سهاف | Amadipsia, Dipsesis, polydipsia | تینوێتییەکی زۆر. |
| شدة كمية الدم | Polyemia | زۆریی خوێن. |
| شدة التيار | Intensity of current | تینی تەوژم، بڕی ئەو کارەبایەی کە بەسەر خاڵێکی بازنەیەکی کارەباییدا تێپەڕ دەبێت لە یەکەی کاتدا. |
| شدة، باقة ، حزمة | Bunch, tuft | دەسك، دەستك، تاخە. |
| شد | Tying Binding | بەستن، شەتەکدان، گرێدان، پێچانەوە. |
| شد سطحي، توتر سطحي | Surface-tension | گرژی رووبی. |
| شد الحبل،، جر الحبل | Tug of war | یاری پەت، راکێشان. |
| شدخ، قطيفة، سالف العروسة، امارنطن | Wild amaranth, Blite | گوڵەقەدیفە، گیایەکە گوڵی مێخەکی مەیلەو ئەرخەوانی دەگرێت. |
| شدف، شدفة | Somites, Segments | ریزەپارچە، ئەو ریزە پارچەیەی کە لەشی هەندێك گیانداری لێ پێکهاتووە وەکوو کرمی زەوی و مێش و مەگەز. |
| شدق | Corner of the mouth, Bucca | ١-لالغاوەی دەم. |
| | Mandible jawbone | ٢- شەویلگە. |
| | Buccal | لالغاوەیی. |
| شدن، شديد | Ceruana | (سیروانا)، گیایەکە لە شوێنە گەرمو بیابانەکاندا دەڕوێت، گوڵەکەی لە یاسەمەن دەچێت. |
| شدو | Singing, warbling | خوێندنی باڵندە، چریکە، جریوە، قاسپە. |
| شديد | Powerful, Srong, Intense | توند، بەتێن، بە زەبر، بەهێز، قایم، قەیم، بە زەبروزەنگ، بەزێپك. |
| شديم، مجوت، قرد المغرب، ماجو، قرد بربري | Pithecusinnus, Magot | (ماگۆت)، مەیمونی خۆرئاوا،رەنگەکەی رەشی مەیلەو زەردە، کلکی کورتە. |
| شذا،عطر | Fragrance | بۆنیەمەتر، بۆنی خۆش. |
| شذان، نبق، سدر | Nabk, Lotus, jujube | تاوك، کینار، کونار، قەنار، درەختێکە بەرەکەی لە عەنەب دەچێت، جۆرە دەرمانێکی لێ دەردەهێنرێت بۆ نەرمکردنی قژ. |

| | | |
|---|---|---|
| شذاة | Giossina | (گلۆسینا) جۆرە مێشێکە دەگەزێت و نەخۆشی بڵاو دەکاتەوە. |
| شذات لاسعة، زمب، ذبابة، تسي تسي | Tsetse fly | مێش، ( تسی تسی)، جۆرە مێشێکە لە ناوچە گەرمەکاندا دەژی نەخۆشی نووستن لەناو مرۆڤ و ئاژەڵدا بڵاو دەکاتەوە. |
| شذام، حمة | Sting, dart | چزوو، چزوی هەنگ. |
| شذامة، صمريص، سمارس | Picarel | (پیکاریل)، جۆرە ماسییەکی بچووکی دەریاییە. |
| شذب، تشذيب شذر | Pruning, triming | هەڵپاچین، کەزاختن، بڕینەوەی لقی زیادی دارو دەوەن. |
| شذر | Scattering | بڵاوکردن، بڵاوبوونەوە. |
| شذر مذر | Helter-Skelter | پەرش و بڵاو، بە هەموو لایەکدا. |
| شذر، فيروز، فيروزج | Turquoise | (١) پیرۆزە، نقێمی شین، بەردێکی بە نرخە لە فوسفەیتی ئەلەمنیۆم و مس پێکهاتووە، رەنگەکەی شینە یان شینی مەیلەو سەوزە.<br>(٢) پارچە زێڕی سروشت.<br>(٣) مرواری دەنگ ورد. |
| شذر | Gold dust | تۆزی ئاڵتون، خاکەی ئاڵتون. |
| شذوذ | Anomaly, Aberration | ناباو، ناناسایی، ناوێزە، ناقوڵایی. |
| شذوذ جنسي، انحراف | Sex perversion | ناباوی، رەگەزیی،لادانی رەگەزیی. |
| شر | Churr, Ddunhn Buying | جۆرە باڵندەیەکە لە پایزدا لە قەراغ دەریاکانی میسری دەژی. |
| شراء ابتياع | Buying | کڕین. |
| شراس، صمغ | Dextrine, Showmak- ers paste | سرێش، ئەسریلك، زەمق، مەتیرە، گەوەن، گەوون، دێکسترین، سترك. |
| شراع | Sail | چارۆکەی با، بایەوان، بادەوان، چارۆگە، ئەیاس. |
| شراع العواصف | Try sail | چارۆکەی رەشەبا، چارۆکەیەکە لە کەشتیدا لە کاتی رەشەبادا هەڵدەکرێت. |
| شراع | Vela, Sails of the ships Argo | چارۆکەی کەشتی، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشوورییە. |
| شراعية، شراعي | Sailing | چارۆکەدار، چارۆکەوان. |
| شراع صغير | By the wind sailor | گیانەوەری چارۆکەدار، کەشتی چارۆکەداری بچووك، کۆمەڵە گیاندارێکی ئاوییە لەشێوەی بۆڕیدایەو لە دەریاکاندا دەژی (دەریای ناوەڕاست) چوار بەشی تیا دیارە، بەشی سەرەوەی وەك چارۆکە وایە کە با لێـی دەدات . دەروات ژێر ئەو بریتییە لە چەند بۆڕییەکی بازنەیی، ژێر ئەمیش بەشێکی رەقی تەنکە، لەژێر ئەوەشەوە چەند گیاندارێکن لەشێوەی بۆڕیدا، رەنگی ئەو کۆمەڵە گیاندارە شینێکی بنەوشەییە، جاری وا هەیە رووی دەریا داگیر دەکەن ئەگەر رەشەبا هەڵیکرد دەچنەوە قەراغ دەریاکەوە خۆیان بە سەرا هەڵ دەگێڕنەوە. |
| شراق | Pitch-pine, Light-wood | تەختەو دارێکە کە زوو بسووتێت. |
| شرارة، شرر | spark, spart, scintilla | پڕیشکە،، بزیسك، چریسك، پڕیشکی ئاگرین، گڕ، چیك، بڵێسە، بروسکە، تروسکە، مەشخەڵ. |
| شرارة كهربائية | Spark (electric) | گڕێکی ئەلیکتریکی، بڵێسەی کارەبایی، پڕیشکی کارەبایی. |
| شراب | Drink, Syrup | شەربەت. |
| شراب الشاي | Theic | چاخۆر، کەسێك زۆر چایی بخواتەوە. |
| شراب، خمر | Wine, Liquor | مەی ، بادە. |
| شراب برطال | | شەرابی پۆرتاڵ، دەرمانێکە بۆ نەخۆشیی ئەسکەربووت باشە. |

| | | |
|---|---|---|
| شلخ، حيوان منوي | Amimalsperm | سپێرمی نێرەی گیاندار، شاوەتی گیاندار. |
| شلر. جلهم، عرقصون، صبرة | Xerus | (زیرۆس)، گیاندارێکە لە کۆمەڵەی سمۆرە تیسکنە، رەنگەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە، لەژێر زەویدا هێلانە دەکات. |
| شلطة | Prangos, Hay plant | گیا کا ، گیایەکی دەشتەکییە گوڵی زەرد دەگرێت بۆ لەوەڕ باشە. |
| شلغم، لفت | Turnip | شێلم، تریۆکە، جۆرە سەوزەیەکە سەلکی گەورەی هەیە، دەکرێت بە ترشیات و چێشت. |
| شلف | Shaving | داتاشین، تاشین، رەوێتن. |
| شلفة | Razor | گوێزان، دەمەچەقۆ، قەمە، سونگی، کافرمان، چەقۆی سەرتاشین. |
| شلفة | Graphium | گرافیەم، کەرووەیەکی زیانبەخشە بە رووەك بە تایبەتی سێو و هەڵووژە. |
| شلقيات، رتبة الاشلاق | Selachii. selachonida | کومەلە ماسییەکی کرکراگەداری درندەیە، وەکوو کۆسەو مشارەماسی |
| شلق. جلكي جلكاء. لامبري | Lamprey | لامیری، ماسییەکی کرکراگەدارە لە ماسی نقە دەچێت، خۆی دەبوو سبینت بە ماسییەکانی ترەوەو خوێنیان دەمژێت. |
| شلفه | Eggs of lizard | هێلکەی مارمیلکە |
| شلك، فروالة، توت الأرض. فريز | Strawberry | سالک شلیك جیلەك چیلك گلیك گیایەکی تەمەن درێژە گەڵاکەی سێ پەلکە لە توو دەچێت سوورو خۆشە. |
| شلك تشيلي | Chilian Strawberry | شلیکی شیلیی. چیلەکی شیلیی. |
| شلك مسكي | Hautboy strawberry | سلیکی مسکیی. چیلەکی بۆنخۆش. |
| شلك فرجيني، شلك احمر | Virginiana strawberry, Scarlet strawberry | شلیکی فەرجینی. شلیکی سوور. |
| [illegible] نقليس. جريث | Commoneel | نقە، مارماسی، ماسییەکی لاکێشەیی پانکەڵەیە [illegible] مەیلەو سەوزە وەکوو مار ژەهری هەیە. |
| شلكون | Chalkone | (چالکۆن)، چەند ئاوێتەیەکی ئەندامیی ئەرۆماتیکن واتا زنجیرە داخراون. |
| شلك، فالج | Paralysis, palsy | لەرزۆکی، ئیفلیجی، گۆجی، شەیلە، جەملە، فالنج، گۆجبوون. گۆتبوون. |
| شلك الحنك | Palatoplegia | ئیفلیجی مەلاشوو، ئیفلیجی چەناگە. |
| شلل الاطفال | Infantile- paralysis | فالنجا بچووکا، ئیفلیجبوونی منال. پەلویوبوونی منال نەخۆشییەکی درمە میکرۆبەکەی لە کۆئەندامی دەماریدا دەژی و دەبێتە هۆی گۆجبوونی قاچ. |
| شلل وردي | Muscardine | (مەسکاردین)، نەخۆشییەکە تووشی کرمی ئاوریشم دەبێت و لەناوی دەبات |
| شل | To paralyze | ئیفلیجکردن، گۆتکردن، پەکخستن. |
| شلل اهتزازي | Shakingm palsy | لەرزۆکی. |
| شلل عضلات العين | Opthalmoplegia | ئیفلیجی، ماسوولکەی چاو. |
| شلل المثانة | Cysoparalysis | ئیفلیجی میزڵدان. |
| شلل عصبي | Neuroparalysis | ئیفلیجی دەماریی. |
| شلل عام | Panplegia | ئیفلیجی گشتیی لەش. |
| شلل كامل | Holoplexia | ئیفلیجی تەواو. |
| شلل عضلات الحنجرة | Laryngoplegia | ئیفلیجی ماسولکەی قورگ. |
| شلل عضلات البلعوم أو الحلق | Pharyngoplegia | ئیفلیجی ماسوولکەی گەروو یان دەم. |
| شلل طرف واحد | Monoplegia | ئیفلیجی یەك پەل. |
| شلل الجانبين | Diplegia | ئیفلیجی لە هەردوو لاوە. |

| | | |
|---|---|---|
| شلل الأطراف | Acroparalysis, Quadriplegia, Tetraplegia | ئيفليجى هەرچوار پەلكە. |
| شلل لاندري | | ئيفليجى لاندرى، جۆرە ئيفليجييەكى كوشندەيە لە مەغزى دركاوييدا دەبێت. |
| شلل الأطراف السفلى | Paraplexia | ئيفليجى لاقەكان، ئيفليجى قاچ. |
| شلل اللسان | Giossolysis | ئيفليجى زمان، لەزمان كەوتن، زمان شكان. |
| شلل الوجه، لقوة | Prosopoplegia | ئيفليجى دەموچاو. |
| شلل نصف الوجه | Hediprosoplegia | ئيفليجى نيوەى دەموچاو. |
| شلل تشنجي | Spastic paralysis | ئيفليجى كۆڵنجى. |
| شلل الجفن | Biepharoplegia | ئيفليجى پێڵووى چاو. |
| شلل نصفي | Hemiplegia | شيفليج بوونى نيوەى لەش، لافالنج، لائيفليجى. |
| شلل الأوعية الدموية | Angloparalysis | ئيفليجى موولوولەى خوێن، ئيفليجى بۆرييە موويينەكانى خوێن. |
| شلل جزئي أو رجفي | Palsyparesis | ئيفليجى بەشيى يان لەرزۆكى. |
| شلل وجني ،لقوة | Bells palsy | ئيفليجى روومەت. |
| شلل القلب | Cardioplegia | ئيفليجى دڵ، فالنجى دڵ. |
| شلل العصب الوجهي | Facial paralysis | ئيفليجى دەمارى دەموچاو. |
| شلم، فلاش | FIASH | (فلاش)، گرێكە بۆ وێنەگرتن لە تاريكيدا بەكار دەهێنرێت. |
| شلمق | | شەلەمە، ترپۆكە، جۆرێكە لە رووەك. |
| شلن، شلنك | Shiling | شلن، دراوێكى ئينگليزييە برێتيە لە يەك بەش لە (٢٠) بەشى جونەيهى ئەسترلينى. |
| شلنغ | Schilling | (شلن) دراوێكە لە نەمسا بەكاردێت. |
| شلوة، شرطام، شرتيم، شلتان | Enarthrocarpus | گيايەكەگوڵى زەرد دەگرێت بەرەكەى لە خرنووك دەچێت. |
| شلوق، سموم | Siroco, Sirocco | (سيرۆكۆ)، بايەكى گەرمى ناخۆشە لە باشوورى خۆرهەڵاتەوە هەڵ دەكات. |
| شلو،عضو | Limb | ئەندام. |
| شليك،فراولة | | بروانە (شلك). |
| شلياق، سلياق، سر واقع قيثارة، أوزة | Lyra Sheliak, Shelyak | (گيتار)، تار، كۆمەڵە ئەستێرەيەكە. |
| شليلة، شلة، سبيخة | Hank, Skein of thread | گلۆلە، خەرێنە، خرێنە، قاتمەبەن، گلۆلەبەن. گلۆلك،گلافە، بێـەكولوو، بێچەك، مرخەك، ماسوولە. |
| شم | Osmesis, olfaction, smelling | بۆنكردن، بێنو بهن كردن. |
| شراس، خوري، أبو قلنسوة | Black cap | كلاورەش، جۆرە بازاڕى، جۆرە باڵندەيەكى كلاورەشە لە بولبول دەچێت، حەز بە هەنجير دەكات. |
| شمال، شمال، شمال، حدواء | North wind, shamal | شەماڵ، باى باكوورى، باى چوروو، باى شەماڵ، باى باكوورى خۆرئاواى كە لە هاويندا هەڵ دەكات لەدەشتەكانەوە. |
| شمال | North | باكوور، ژوورو. |
| شماط، حداة، عقاب نسارية، عقاب البحر | Osprey | كۆلارەى دەريا، جۆرە داڵێكە لە قەراغ ئاودا دەژى، گياندارى بچووكى وەكوو باڵندەو ماسيى دەخوات. |
| شماذ، شامذ | Theridiides | جۆرێكە لە جاڵجاڵۆكە. |

| | | |
|---|---|---|
| شمالي | Northren | کوێستانی، ژوروو، باکووریی، بالأ. |
| شمال شرقي | North east | باکووری خۆرهەلاتی. |
| شمال غربي | North west | باکوری خۆرئاوایی. |
| شمار، شمر، شمرة، شومار، رازيانج | Fennel, foeniculum | رازیانە، رزیانە، لۆ، جۆرە گیایەکە گوڵەکەی وەك چەتر وایە بۆنێکی خۆشی هەیە، گەڵاکەی وردە دەخورێت، قەدەکەی خڕو رووتە، دەنکەکەی بۆ مەبەستی خواردەمەنیو بەهاراتو پزیشکی بەکاردێت |
| شمار الماء | Water fennel | رازیانەی ئاویی، رووەکێکی دەشتەکەیە گوڵەکەی لەشێوەی چەتر دایە. |
| شمام، بطيخ اصفر، قاوو، عبد اللاوي | Melon, Musk melon, mango melon | کاڵەك، گوندۆرە، کەلێك شێوەو رەنگی هەیە بۆنخۆشو شیرینە. |
| شمام اخضر، بطيخ اخضر، شمام مضلع، كوز عسل | Cantaloupe-melon | کاڵەکی سەوزی گەورەی قاش قاش. |
| شمان عجمي | Apple cucumber, Queen Anns melon, Dudaim melon | شەمامە، شەمامۆك، جۆرە کاڵەکێکی زەردە، هێڵی سووری پێوەیە بچووكو بۆنخۆشە هێندەی پرتەقاڵێك دەبێت. بۆ مەبەستی رازاندنەوە دەروێنرێت. |
| شمام مصري، بطيخ اصفر | Sweet melon | کاڵەکە زەردە. |
| شمامة ، مصباح البترول | Lampburner | برغوی بڵێتەی چرا. |
| شماع، صانع الشموع | Tallow chandler, Wax chandler | مۆمکار، مۆم دروستکەر، مۆم فرۆش |
| شماعة، صناعة الشمع | Chandlerly | مۆم دروستکردن. |
| شماعة الملابس، شجب، شجاب | Coal rack, rail | عەاگەی جل، هەپە. |
| شماعة مدخل، شماعة صالة | Hall stand | عەلاگەی جل لە هۆڵدا دادەنرێت |
| شماريخ، الشماريخ | Aishamarish | (ئەلشەماریخ)، شکۆفە، ناوی ئەستێرەیەکە |
| شمالأ، شمار، صدرية الثدي، حمالة الثدي | Brassiere, Under-bodice, Sappoting breasts | سوتیان، سوخمەی مەمك |
| شمبراي | Chambray | شەمبرای، قوماشێکە تەنکە لە لۆکە دروست دەکرێت |
| شمبانزي، بعام، غول | Chimpanzee | شازی(شەمپانزی) زیرەکترین مەیموونەو لە ئادەمیزاد دەچێت. |
| شمبانيا | Champagne | (شەمپانیا)، شامپێن، چاکترین جۆرە لە مەی. |
| شمبكة، شمبق | Champaca, Champ wood, Champack | (شامپاك)، جۆرە درەختێکی پزیشکیيە گوڵەکەی بۆ هەڵامەتو سەرئێشە باشە، هەروەها عەترێکی نایابی لێ دەردەهێنرێت. |
| شمذ، رفع الذنب | Raising the tail | کلك، بەرزکردنەوەی گیانەوەر. |
| شمذة | Arbre- support | درەختی راگیرکردن، هەر درەختێك لە پاڵ داری مێودا بروێنرێت بۆ ئەوەی کە راگیری بکات. |
| شمراخ، شمروخ | Peduncle, Fiower stalk, Thyrsus | (١) لاسکۆکە، لاسکی گوڵو بەر، هێشوو، هۆشە، هێشی.<br>(٢) شێوەیەکە لە شێوەکانی گوڵکردن وەکوو لە گوڵی لەیلاقدا. |
| شمرة، شمر | | بڕوانە(شمار، رازیانج). |
| شمر الجبل، شرعوب حقلي | Hedge parsley | مەعدەنووسی پەرژین، رازیانە کێویلە، گیایەکی دەشتەکیيە لەناو کێڵگەدا دەروێت، گوڵەکەی بۆنخۆشە، رەگەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شمرة بحرية | Samphire sea, fennel, | (شامفیر)، رازیانەی دەریا، گیایەکی قەراغ دەریایەدەکرێتە ترشیاتەوە. |
| شمر الخنازیر، بخور الأكراد | | رازیانەی بەراز، بخووردی کوردی، ڕووەکێکی دەشتەکی پزیشکییە،گوڵەکەی لە چەتر دەچێت، دەرمانی سنگ ئێشەو زەردویی لێ دەردەهێنرێت. |
| شرنس طرناليا | Tornella | (تۆرنیلیا)، ڕووەکێکی خشۆکە بەرەکەی قۆچەکییە، سەوزە لە دواییدا زەردو شیرین و بۆنخۆش دەبێت. |
| شمسية، مظلة | Parasole, Sunshade | چەتر، سەیوان، چەتری سێبەر. |
| شمسية المطر | Umbrella | چەتر، چەتری باران. |
| شمسية (اروكاريا) | Araucaria | (ئەرۆکاریا)، جۆرێکە لە سنەوبەر. |
| شمس، النير الأعظم | Sun, Helios | خۆر، ڕۆژ، خاوەر، ئەستێرەیەکی جێگیرە، بریتییە لە خڕۆکێکی گازی، پلەی گەرمی ڕووەکەی نزیکەی (٦٠٠٠) پلەو پلەی گەرم، ناوەوەی نزیکەی چل ملیۆن دەبێت، تیرەکەی (١٠٩) ئەوەندەی تیرەی خڕۆکی زەوییە. |
| شمسة | Big bead | شامورو، دەنکە موروی گەورە. |
| شمس كاذبة | Mock Sun | وێنەیەکی خەیاڵییە، بۆ خۆر. |
| شميات | Heliozoa | ڕۆژییەکان، خۆرییەکان، کۆمەڵە گیاندارێکی ڕەگدارن بە میکرۆسکۆب دەبینرێن. |
| شمس لاتغرب، شمس منتصف الليل | Midnight sun | خۆری نیوەشەو، خۆری ئاوانەبوو، بینینی خۆر لە (٢٤) سەعاتەی وەرزی هاویندا لە هەردوو پۆڵەکەدا. |
| شمسي اليف الشمس | Heliophile | خۆرخواز، ئەو ڕووەکەی کە حەز بە خۆر دەکات. |
| شمسي | Solar sunny | خۆریی، هەرشتێك پەیوەندی بە خۆرەوە هەبێت. |
| شمسية الشباك | Persienne, window blind | چەتری پەنجەرە، تەختەیەکی کون کونە دەگیرێت بەسەر پەنجەرەدا بۆ سێبەر کردن. |
| شمشاد، بقس، شمشار، شمشير | Box tree, Buxus | شمشار، درەختێکی هەمیشە سەوزی سستە لە گەورەبووندا لە (٨) مەتر زیاتر بەرز نابێتەوە بۆ ڕازاندنەوە لە باخچەکاندا بەکار دەهێنرێت، بەشێوەیەکی هەندەسی دەبڕدرێت، وەکوو خڕ یان شەشپاڵو یان لوولە بەم جۆرە دەمێنێتەوە بۆ ماوەیەکی درێژو بۆ پەرژینیش بەکار دەهێنرێت و هەمیشە سەوزە. |
| شمشيل، فيل | Elephant | فیل، گیاندارێکی شیردەری سەداری کەتەیە، لموزی درێژە. |
| شمشم، منثور بري، خمخم | Gilliflower | شەوبۆ کێویلە. |
| شمط | Blending (of wines) | تێکەڵاوکردنی چەند جۆرێك لە شەراب بۆ مەبەستێکی تایبەتی. |
| شمعة (للأضاءة) | Candle, Wax candle | مۆم، قاڵبەمۆم. |
| شمعة الأحتراق | Bougie | مۆمی سووتان، دەزگایەکی لوولەیی بچووکە، بزیسکێك پەیدا دەکات بۆ سووتاندنی سووتەمەنی لە بزوێنەرەکەدا. |
| شمع جبلي، شمع معدني | Mountain wax | مۆمی چیایی، مۆمی کانزایی. |
| شمع، شمع النحل الأبيض | Wax, Cera albe | مۆم، شەمێ، شەم، فند، مۆمی سپی، مێوی سپی. |
| شمع النحل الأصفر | Cera flava | مۆمی زەرد، مێوی زەرد. |
| شمع معدني، اوزوكريت | Ozokerite, Ozocerite | (ئۆزۆکریت)، مۆمنایین مۆمی کانزایی. |
| شمع التطعيم | Grafting wax | مۆمی موتوربەکردن، ئەو مۆمەی کە شوێنی موتوربەکردنی درەختی پێ دادەپۆشرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شمع نباتي | Vegetable wax | مۆمی رووەكی، وەكوو ئەو مۆمەی كە لە توێكڵی بەری دار مۆمی پەنسلڤانیادا دەردەهێنرێت. |
| شمع البارافين | Paraffin wax | مۆمی پارافین، مادەیەكی چەورییە لە تەختەو پەترۆل دەردەهێنرێت بۆ دروستكردنی مۆم. |
| شمع احمر،ختام، شمع الختم | Sealing Wax | مۆمی سوور، لۆك، لۆكی سوور، مۆمی لۆك. |
| شمع العسل، عسو، شمع اصفر، شمع اسكندراني | Bee- wax | تڵپەی هەنگوین، مێوی زەرد، مێو، شەما مۆمی زەرد، بەرەمێو، بەرەمۆم، مادەیەكە هەنگ دروستی دەكات بۆ دروستكردنی شانەكەی. |
| شمع كرنوبة، شمع كارنوبا | Carnauba-wax | مۆمی كارنوبا، مۆمێكە لە توێكڵ و رەگ و گەڵای دارخورمای بەرازیلی (كارنوبا) دەردەهێنرێت، مۆمێكی زۆر رەقە لە دروستكردنی مادەی بریسكەدەرو مەرەكەبی چاپكردن لەسەر پەردەو قوماشدا بەكاردێت. |
| شمع صيني | Chinese Wax, insect Wax | مۆمی چینی جۆرە مۆمێكە لە مێش و مەگەزێك دەردەهێنرێت كە لە چین دەژی، لە دروستكردنی بۆیەو مۆمی سووتاندندا بەكاردێت |
| شمع ياباني | Japan wax | لۆكی جاپانی، مۆمی جاپانی، جۆرە مۆمێكە لە كولاندنی تۆوی ترشی سماق یان قلیشاندنەوەی توێكڵی درەختەكەی دەستگیر دەبێت. |
| شمع رخو، شمع خامد | Slack Wax | مۆمی خاو، مۆمی مردوو |
| شمع الأذن، اف، صملاخ | Ear wax, Cerumen | چڵكی گوێ، مێوی گوێ، قریژا گوهی، مادەیەكی مۆمیی زەردە كە [illegible] دەری دەدات بۆ گلدانەوەی تەپوتۆزی دەرەوەی گوێچكە |
| شمعـــة عياريـــة، شمعة دولية | International, Standard carndle, Candle | مۆمی پێوانیەیی، جۆرە مۆمێكە تایبەتیە زەبری رووناكییدانەوەی پێ دەپێورێت. |
| شمعة الأستقصاء | Bougie | مۆمی پشكنین ئامرازێكی باریكی نەرمە، دەكرێت بە بۆرییەك[illegible] بۆ مەبەستی گەورەكردن یان پشكنین. |
| شمعة الشحم | Adipocere | مۆمی پیو، میوی بەز. |
| شمعيات | Myriaceae | مۆمییەكان، كۆمەڵە رووەكێكی دوو لەتكەیییە بەشێوەی دارو دەوەن، گەڵاكانیان بچووكن، بە كوڵاندنیان مادەیەكی مۆمیان لێ دەست دەكەوێت. |
| شمعدان | Candle stick | شەمدان، مۆمدان، بێسوس، لالە، شتێكە لە شێوەی قاپدا مۆمی داگیرساوی تێدا دادەنرێن. |
| شمعي | Waxen, cermuninous-ceraceus | مۆمی، شتێك پەیوەندی بە مۆمەوە هەبێت. |
| شمعي الجناح | Wax wing | باڵ مۆمی، باڵندەیەكە سەری پەڕەكەی چوكڵەی ئەوتۆی پێوەیە كە لە (لۆك) مۆمی سوور دەچێت. |
| شمعية، شجرة الشمع | Bey berry, Candle berry-myrtle wax myrtle, Myrica | درەختی مۆم، دارو دەوەنێكی گەڵاكەی مۆمی لێ دەگیرێت، گوڵەكەی سەوزە بەرەكەی لە ترێ دەچێت یەك دەنكی تیایە بە مادەیەكی مۆمی داپۆشراوە. |
| شمعية تطرية | Sweet gale, Bog myrtle | دارمۆمی بۆنخۆش، جۆرێكە لە درەختی مۆم لە زەلكاودا دەڕوێت. |
| شمع، هوس مرحي | Amenomania | نەخۆشیی لە خۆباییبون یان خۆ بەزلزانین، نەخۆشییەكی دەدەروونییە. |
| شمل، شماليل | Peduncleof Cluster of dates | لاسكی هێشووی دارخورما. |
| شملة | Toga, mantle | پۆشاكێكی گەورەو فراوان وەكوو عەبا. |
| شملول | Small quantity, Brisk, Nimble | (١) برێكی كەم، بچەك.<br>(٢) سووكەڵە، سڤك. |
| شم | Smell, Olfaction, Osmesis | بۆنكردن، بهنكردن. |

| | | |
|---|---|---|
| شمي | Olfactory | بۆنی هەرشتێك پەیوەندی بە بۆنكردن یان ئەندامی بۆنكردنەوە هەبێت. |
| شم كاذب | Pseudosmia | بۆنكردنی درۆزنە گەندە بۆنكردن. |
| شمندور، لبأ | Beestings | ژەك، مادەیەكی رەقە لە گوانی گیاندارەكاندا هەیە هەتا نەیەتە دەرێ شیرەكەی بەرنابێت. |
| شمنـــــدر، شـــــوندر، بنجر،صوطلة، صعطلة | Beet, root, sugarBeet, Chard | چەوەندەر، چەوەنەر، رووەكێكی رەگەكەی لەشێوەی سەلكێكی گەورەدایە تامەكەی شیرینە، دەكرێت بەچێشت یان شەكری لێ دەردەهێنرێت. |
| شمندر بري، شوندر بري | Wild beet | چەوەندەر كێویلە، گیایەكە رەگەكەی باریكە لە زونگاوو شوێنی تەڕدا دەڕوێت. |
| شمندورة، عوامة الأرشاد، عوامة التحذير | Alarm- buog | ئامرازێكی سەرئاو كەوتووە بۆ ئاگاداركردنی پاپۆڕ لە دەریادا |
| شموص، شموس، حرون | Refractory | شەمبۆز، شەموز، سەركێش، سڵ، لارەجلەو، قوشكی، نارام، تۆسن، چەمووش، یاخی سرك، ولاخێكە كە بۆ باركردنی یان سواربوون نەوەستێت. |
| شمواة، فدر، فادر | Chamois, Rupicarpa-tragus | شەمكۆر، ئاسكی یەك ساڵە، جۆرێكە لە ئاسك، لە بزنەكێوی دەچێت، دوو شاخی كلۆری چەماوەی هەیە. |
| شموا | Chamois-leather | پێستی شەمكۆر. |
| شموع الصحراء | Limonium-spicata | مۆمی بیابان، لیمۆی دڕكاویی، جۆرە رووەكێكە. |
| شمور، الماس | Diamond | ئەڵماس، جۆرێكی بلورییە لە شێوەكانی كاربۆن، بێرەنگە، یان رەنگینە، لە دروستكردنی خشڵو شووشە بڕینەوەدا بەكاردێت. |
| شمول توتي | Mullberry | هەر بەرێكی رووەكی لە تۆ و بچێت وەكوو توو و شلیك. |
| شميسة، زعيترة | Micromeria | (جاتروكە)، گیایەكە دەشتەكییە گەڵاكەی وردە، گوڵی وردی سپیو سوور و شین دەگرێت. |
| شميطة، عقاب الشط | White tailed-eagle | هەڵۆی كگبك سپی، داڵی دەریا، جۆرە داڵێكی ژێر سكیو دەنووكی سپییە، دەنووكو نینۆكی زەردە لە قەراغ ئاودا دەژی. |
| شناق | Rope, Cord | پەت. |
| شنار، حجل رومي، قبج، يعقوب | Red- legged- partridge, Rock partridge | كەو، باڵندەیەوكی خۆشئاوازە، لە سویسكە دەچێت، رەنگەكەی خۆڵەمێشییە، دەنووكو قاچی سوورە، ژێر سكی سپییە هێڵی رەشی پێوەیە ، لە ناوچە شاخاوییو بەردەڵانیەكاندا دەژی، ماڵییش دەكرێت، خوێندنەكەی پێی دەگوترێت قاسپە دەخرێتە قەفەزەوە، لە كوردستاندا زۆرە. |
| شنار، جنار | Plane-tree, platonus, Chenar | سوورەچنار، درەختێكە گەڵاكەی دەڕوێت، گەڵایەكی گەورەی هەیە لە لەپی دەست دەچێت، كەڵك لە تەختەكەی وەردەگیرێتو بەرێكی خڕی هەیە بە دەزوولەیەكی درێژ شۆڕ دەبێتەوە بۆ خوارەوە. |
| شنان، اشنان، حرض | Salt wort | ئەسپۆن، رووەكێكە هاڕراوە وشكەوەبووەكەی لە جیاتی سابون بەكاردێت. |
| شنانة، دماع | Pleurs | ئاوكی رووەك، كە لە قڵیشاندنی قەدو لقەكەی دێتە دەرەوە. |
| شناري، فهد الثلوج | Wild cat | (١) پشیلە كێوی.<br>(٢) وێزی بەفر. |
| شنب، شارب | Mostache | بڕوانە، (شارب). |
| شنبة | Rice | جۆرێكە لە برنج. |

| | | |
|---|---|---|
| شنبق | Champac, Champak | (چامپاك) رووەكێكە گوڵەكەی زەردە. |
| شنبليد، زهر السورنجان | Flowers of colchicum | گوڵی سورەجان. |
| شنترة، شنترة | Palmure | چەق، چەرمێكی تەنكە لە نێوانی پەنجەكانی باڵندەی ئاوییدا. |
| شنتونغ | Shantung | (شانتۆنگ)، جۆرە قوماشێكە. |
| شنج، تشنج | Spasm, Spasmus | گرژبوون، كۆڵنج. |
| شنج | Great snail | شەیتانۆكەیەكی گەورەیە. |
| شنجار،، رجل الحمام، خس الحمار،كحلاء، حميراء | Orcanet, Bugloss, AlKanet | پێكۆترە، رووەكێكی دەشتەكییە، بۆ مەبەستی رازاندنەوە بەكاردێت، مادەیەكی سوور لە رەگەكەی دەردەهێنرێت بۆ رەنگكردن. |
| شنجار صباغي، انشوزة صباغية. بوغلض الصباغين، حنة الغول | Dyres-bugloss Dyers-Orcanet | پێكۆترەی رەنگكردن، جۆرێكە لە پێكۆترە گوڵێكی بۆنخۆشی هەیە بە زۆری رەنگەكەی زەردە، رەنگێكی سووری لە رەگەكەی دەردەهێنرێت. |
| شنجبار، انجبار، حب القلب، كاسر الحجر | Bastard-alkanet, Gromwell | گیایەكی دەشتەكییە هەندێكی بۆ مەبەستی پزیشكی و هەندێكی رەنگی سوور لە رەگەكەی دەردەهێنرێت. |
| شنج الحاجب شندقورة | Ophryosis | گرژبوونی برۆ، گرژبوون و كشانی برۆ، لەرزۆكی برۆ. گوێی ولاخ، جۆرە رووەكێكی سركەرە. |
| شنداب،قرصعنة | Eryngo,Eringo | (ئێرینگۆ)، گیایەكی دڕكاوییە گوڵی شین یان سەوز یان سپی دەگرێت، لە كەرتەشی دەچێت. |
| شنداب بحري | Sea holly, sea holm | ئێرینگۆی دەریا، جۆرێكی بچووكە (ئێرینگۆ) رەگەكەی خۆش دەكرێت و دەخورێت. |
| شندل | Locustella | كوللە خۆرە، باڵندەیەكە لە چۆلەكە دەچێت. |
| شنس | Nerine | (نیراین) گیایەكە لە كۆمەڵەی نێرگز، گوڵی پەمبەیی یان ئەرخەوانی دەگرێت. |
| شنسروخ | Sparrow wort | گیا چۆلەكە، دەوەنێكە گوڵەكەی بەشێوەی مێشووە، بەزۆری رەنگەكەی شینە. |
| شنشيلان، شنشيلة | Chin chilla | (شینشیلە)، گیاندارێكی شیردەری قرتێنەری بچووكە لە كەروێشك دەچێت، رەنگەكەی قاوەیی كاڵە، پێستەكەی بە نرخە، لە ئەمریكای باشووری دەژی. |
| شصر، راتل، ابو كيم، اكل العسل | Ratel | هەنگوینخۆرە، گیاندارێكە كە چوالوو دەچێت حەز لە هەنگوین دەكات. |
| شنطة، سنتة، حقيبة | Bag,Valise | جانتا، باوەڵ، توربە. |
| شنطة الكتب | Stachel | جانتای كتێب. |
| شنطة يد، محفظة | Hand bag | جانتای دەست. |
| شنطف، خلنج | Heath, erica | (هیث)، جۆرە رووەكێكە، رووەكێكی دوو لەپكەییە، گوڵەكەی یەك پەرەی هەیە. |
| شنف، شوف | Thorn | دڕك. |
| شنف، قرط | Earring | گوارە، گوهارك. |
| شنف، جلع، انقيلاب، الشفة العليا | Eclablum Chliectropion | هەڵگەڕانەوەی لێوی سەرەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| شنف | To leer at -look askance at | تیلایی چاو، سەیرکردن بە تیلایی چاو. |
| شنف الدیك، دلبرجیة، مران الهند | Indian beech, poongoil-plant, dalbergia | (دەلبەرجیا) درەختێکە تەختەکەی سوورو بە نرخە گەڵاکەی ئاوێتەیە ، گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی سپییە، رۆنێکی تایبەتی لێ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی رووناککردنەوەو پزیشکی . |
| شنق | Hanging, Execution by hanging | خنکاندن، خەندقاندن، بەداراکردن، بە پەتك هەڵاوسین، لە سێدارەدان. |
| شنقار، شنقور، سنقر | Gerfalcon, Gyr falcon | شمقار، هەڵۆی سپی، جۆرە باڵندەیەکە. |
| شنقب، شکب، بکاسین، بکاشین، شنقاب | Snipe jude cock, Long bill | قوڕاویلە، قوڕاویلکە، جۆرە باڵندەیەکی دەنووك درێژە. |
| شنقل، منقلة | Asiatica water-ouzel | قەلمراو، جۆرێکە لە مریشکی ئاویی، دەچێتە ئاوەوەو مێرووی ئاویی دەخوات. |
| شنك | Shank | (شانگ)، جۆرێکی گەورەیە لە گیانداری گوێچکە ماسی |
| شنکار | Marking-gauge | دەزگایەکە بۆ هێڵکێشانی شتوومەکی دروستکراو. |
| شنکل، کلاب | Hook | چنگاڵ. |
| شنطل، ورزة | Hook and eye | ئەڵقەرێژ. |
| شنکار، النجار | Marking-gauge, | دەزگایەکە لای دارتاشەکان بۆ پلوانەو هێڵکێشان |
| شنکیس. طاووس التبت | Thibet-peacock | تاووسی تیبەت، باڵندەیەکی رەنگینە لە تاووس و لە چۆرەپۆر دەچێت. |
| شنم | Polypterus | ماسییەکی دەریایی لوولەیی درێژە پەڕەکانی پشتی وەك ددانی مشار وایە. |
| شنمول | Chaenomele | شانەمۆل، دەوەنێکی دڕکاوییە، بەرەکەی لە بەهێ دەچێت، ترش و تفتە. |
| شن، قربة | Water skin | کوندە، کوندەی ئاو. |
| شنینة | Milk sour | دۆ، ماستاو. |
| شنینة مکثفة، مخیض مکثف | | سوێرەکە، خەستە. |
| شنیل | Chenille | (شانیل)، قوماشێکی ئاوریشم یان لۆکەی ڕێشوەدارە. |
| شهاب (شهب) | Meteor, Shooting or falling star, Luminous-meteor | شۆلە، تیرشهاو، ئەستێرەی کشاو، بریتیە لە تەنێکی ئاسمانی بچووك بە بۆشاییدا دەڕۆوات، کە لە خڕۆکی زەوی نزیك دەبێتەوە بەهۆی هێزی راکێشانەوە، دەکەوێتە ناو هەوای زەوییەوەو کڵپە دەسەنێت و دەبێت بە خۆڵەمێش و بەشێوەی گڕێکی کشاوو بە رەنگێکی سپی یان شینی کاڵ یان سوور دەردەکەوێت. |
| شهاب متفجر | Bolide | شۆلە تەقیو، تیرشەهاوی تەقیوو. |
| شهادة | Certificate | بڕوانامە، باوەڕنامە. |
| شهادة نهائیة | Diploma | (دیپلۆم)، بڕوانامەی کۆتایی، باوەڕنامەی دوایی. |
| شهادة جنسیة | Nationality certificate | بڕوانامەی رەگەزناسین، رەگەزنامە. |
| شهام، سعلاة، | Orangoutan | (ئۆرانگ ئۆتان)، مرۆڤی دارستان، مەیمونێکە لە پلە بەرزەکان لە دورگەی بۆرینۆ سۆترۆمەدا دەژی، جۆرە مەیمونێکە. |
| شهباز، شاه باز | Gashawk | شاباز، بازی تەواوی گەورە. |
| شهبان | Caffrelil- natalilly | شابان، گیایەکە لە کۆمەڵەی نێرگز، گوڵەکەی گەورەو سوور یان پرتەقاڵییە، بەرەکەی سوورە. |
| شهب | | بڕوانە (شهاب). |
| شهبة | Grayness, Hoariness | رەنگی ماش و برنج واتا رەش و سپی تێکەڵ. |

| | | |
|---|---|---|
| شهد، شهد | Honey comb | دووبەرە هەنگوین، هەنگوین، رینگاڵ، هەنگوین بە شانەکەیەوە. |
| شهدة | Kerion | پەیدابوونی زیپکە لە پێستی سەردا. |
| شهدانج، قنبز | Hemp seed | تۆوی رووەکی گوش. |
| شهر | Month | مانگ، هەیڤ، مەهـ رۆژ بەشێکە لە (١٢) بەشی ساڵ. |
| شهري | Mensal, Monthly | مانگی، هەر شتێك پەیوەندی بە مانگەوە هەبێت. |
| شهر اقتراني | Synodic month | ماوەی سووری (خولگەی) هەیڤ بە دەوری زەویدا بە گوێرەی ٠لەچاو) خۆردا. |
| شهر نجمي | Sidereal month | مانگی ئەستێرەیی، دەکاتە (٢٧) رۆژو (٧) سەعاتو (٤٢، خولەكو (٥و١١) چرکە. |
| شهري قمري | Lunar month | مانگی هەیڤی کە دەکاتە(٥و٢٩) رۆژ. |
| شهرية، مشاهرة، راتب شهري | Monthly | مانگانە، کرێی مانگێك. |
| شهر شمسي | month,<br>Solar month | مانگی خۆریی، بەشێکە لە دوانزە بەشی ساڵی خۆریی. |
| شهرمان | Shelduck, sheldrake | شارەمان، جۆرە مراوییەکە دەنووکی چاڵە لەژێر ملیدا تەوقێکی رەش و تەوقێکی سوور هەیە. |
| شهرة | Fame, renown | ناوبانگ، نامەدەنگ. |
| شهقة، فواق، حازوقة | Orthopneaclangosa,<br>Hiccough, Hiccup | نزرکە، نێسك نزرکە. |
| شهشة السعال الديكي | Back-draught,<br>whooping-cough,<br>pertussis | کۆکەڕەشە، نەخۆشی‌یەکی درمە لەناو منداڵاندا بڵاو دەبێتەوە، دەنگی کۆکەکەی لە خوێندنی کەڵەشێر دەچێت. |
| شهلاء | Blueeyed gril | چاوکاڵ، چاوەڕەیش مەیلەو شین. |
| شهل، شهلة، زرقة العين | Blueness of the eyes,<br>Luminosity of pupil | چوێك، رەشی مەیلەو شین بێت. |
| شهل، شول، سريع في العمل | Nimble, quick | سووکەڵە، دەست سڤك. |
| شهوانية | Tragalism | ئاڵۆشی، حەشەرێتی. |
| شهوة جنسية،<br>شهوة الوقاع، غلمة | Lust, carnal- appetite | ئارەزوویی رەگەزی، ئارەزووی جووتگرتن، هەوەس، حەشەرێتی، ئاڵۆشی رەگەزیبەجۆشی، ئەلۆری. |
| شهوة جنسية غريزة | Libide, libido | (لیبید) ئاڵۆشی رەگەزی رەمەکی. |
| شهور بهيمية | Bestial-passion | ئاڵۆشی رەگەزی دڕندانە. |
| شهوة بالم | Algolagnia, lust | ئاڵۆشی بە ئازار، ئاڵۆشێك کە ئازاردانی کەسێکی بەرامبەری تیادابێت. |
| شهوة الطين، وحام خمخمة | Alotriophagy<br>Pica, picage | (١) بێزوو، بێزوکردن.<br>(٢) هەندێك ولاخ و ئاژەڵ ئارەزووی خواردنو گڵو خوریو پێستەو پەڕ دەکەن لە ئەنجامی کەمی هەندێك مادەی کیمیایی لە لەشیاندا. |
| شهواني، غليم | Lecherous, lustful | ئەلۆر، بە جۆشی، حەشەری، بە ئاڵۆش، ئاڵۆشاوی. |
| شهية (للأكل) | Appetite, Orexia | ئیشتیا، ئیشتیهای خواردن، ئارەزووی خواردن، مەگیز، مجێز، دڵبردن، گزوفت. |
| شهي الطعم لذيذ | Delicious | تامخۆش، خۆش، بەتام. |
| شهيق | Inhalation, Inhaling, Inspiration | هەناسەوەرگرتن. |
| شهيق الحمار . | Braying | زەڕین، زەڕینی کەر. |

| | | |
|---|---|---|
| شوائب | Impurities | خلتە، تلپە، سەرکزەرە. بن بێژنگ. |
| شوائب الصوف الشحمية | Yolk | ئەو چەورییەی کە لە خوری دەگیرێت. |
| شوائب القطن والصوف | Motes | خلتەی لۆکەو خوری. |
| شواش عصبي | Neuropsychosis | پشێوی دەماریی و دەروونی. |
| شوائب معدنية | Gangue | (گانگ) خلتەی کانزاو خۆڵ کە لەناو کەرەسە خاوە بە نرخەکاندا هەن. |
| شواك | Acanthosis | نەخۆشییەکی پێستە، نەخۆشی پێستی درکاوی. |
| شواء، لحم مشوي | Roast | برژاو، گۆشتی برژاو. |
| شواء | Roaster | برژێنەر، وەکوو کەبابچی. |
| شواة ، فروة الراس | Scalp, pericarnium | پێستی سەر. |
| شوادن | Inclemency | بارەکانی کەشی ناهەموار. |
| شوار | Male and female organs | ئەندامی رەگەزیی مێروو ، نێر یان مێ. |
| شؤبوب، رذاذ المطر، مطر خفيف | Drizzle, fine, rain, A shower of rain | دڵۆپەی وردی باران، تاوی باران. |
| شؤون | Affairs | کاروبار. |
| شوارب عنتر، قرطم بري | Distaff- thistle, wooly safflower | زەعفەرانە کێویلە، گیایەکە یان دەوەنێکە رەنگی گوڵەکەی پرتەقاڵییە ئاوکی قەدەکەی سوورە. |
| شواظ، شواظ | Prominence | بڵێسەی گڕی بێ دووکەڵ. |
| شواظ الشمس، السنة سمسية | Solar-prominence | بڵێسەی خۆر، گڕێکی سوورە یان پەڵە گازێکە لە هەور دەچێت لە خۆرەوە درێژ دەبێتەوە هەندێك جار بۆ ماوەی (٢) ملیۆن کیلۆمەتر. |
| شواظة، فلوكس | Phlox | (فلۆکس) گیایەکە گوڵی هەمەجۆری جوان دەگرێت. |
| شواس | Pavetta | (پاڤیتا)، دەوەنێکی پزیشکییە گوڵەکەی سپی یان سەوزو بۆنخۆشە. |
| شواق، شب الليل | | گیایەکە لە شەوبۆ دەچێت سەلکی هەیە گوڵەکەی لە ئێوارەوە تا بەرەبەیان گەشە. |
| شوالة، هازجة، دخلة شوالة | Pitchu, warbler, Chiff-Chaff | (پیچوو) باڵندەیەکە لە چۆلەکە دەچێت |
| شوال، جوالق | Large sack | جەوال، جۆرە توورەکەیەکی گەورەیە. |
| شوان | Seedsman | عەلاف، خەلەفرۆش. |
| شواية، عشواة | Grill, Gridiron | ئامرازی برژاندن. |
| شوبك، شوبق، مطلمة، شيبك | Rolling pin | تیرۆك، کرتناك، بازی، تیرۆکی گەورە بۆ کولیچە دروستکردن. |
| شوب | Soup of onions | پیازاو، شۆربای پیاز. |
| شوب | Chub | (چوپ)، جۆرە ماسیەکە لە رووباردا دەژی. |
| شوب ، شونكة | Rolls or loaves of dough | گونکە هەویر، گرك، پەپکە، بەشی یەك نان لە هەویر. |
| شوب، خليط | Mixture | تێکەڵاو، تێکەڵ. |
| شوب، ريح حارة | Hotwind, Sirocco | بایەکی گەرم، بایەکی ووشکی تۆزاویی. |
| شوبر، بلوط البلين | Cork Oak | بەرووی تەپەدۆر، جۆرێکە لە داری بەروو تەپەدۆر لە توێکڵەکەی دەردەهێنرێت. |
| شوح، تنوب اناضولي | Fir tree, spruce | جۆرێکە لە داری سنەوبەر. |
| شوحة، رخمة | Egyptian-vulture, pharaoh-hen | سیسارکگی میسری. |

| | | |
|---|---|---|
| شوحط، سدر جبلي | Yew tree, Acalypha-fruticosa | تاوکە کێویلە، درەختێکە چەند لقێکی لە زەوییەوە لێ دێتە دەرەوە بەرز دەبنەوە، گەڵاکەی تەنکە بەرەکەی درێژکۆڵەو نەرمە دەخورێ بۆ رەوانی باشە. |
| شودر | Chowder | (چۆودەر) شۆربایەکە لە ماسی و پەتاتە و پیاز دروست دەکرێت |
| شوخم | Aeschynanthus | رووەکێکی خشۆمی کەپرییە گوڵی گەورەو سوور دەگرێت. |
| شودل | Phragmidium | (فراگمیدیەم)، کەڕوویەکی زیانبەخشە، بە گوڵەباخ. |
| شورب، خاطف الذباب | Fly catcher | مێشگرە، چۆلەکەیەکی بەلەکە. |
| شورل | Schorl | (شۆرل) شەوە، جۆرێکی رەشە لە تۆرماڵی و کوارتز. بەردیکی بە نرخە. |
| شورة، ملح البارود | Niter, Nitre | شۆرەکات، خوسار، خوێی باڕووتی لێ دروست دەکرێت |
| شوربة، شوربا | Soup | شۆربا، زەلکە، چێشتێکی شلە. |
| شوربة عدس | Lentil soup | نیسکێنە، شۆربای نیسك. |
| شوربة الماش | Green gram soup | ماشێنە، شۆربای ماش. |
| شوري | Wild mangrove | (مانگرۆڤە کێویلە)، درەختێکە توێکڵەکەی ترشە. گوڵەکەی رەنگی لە دەردەهێنرێت. |
| شورة، قفير | Bee-hive | شانەی هەنگ، دووبەرەی هەنگ |
| شوشة | Style | قەلاس، قەلاسی گەنمو جۆ. |
| شوشة قنزعة | Tuft of hair, crown of head | تۆپەڵە تووکی سەر ، پەڕی سەری باڵندە. |
| شوش | Zanclus | (زانکلەس)، ماسییەکی خڕی پانکەلەیە، وەکوو باڵی هەبێت وایە. باڵی شتێکی پێومیە لە کلك دەچێت. |
| شوشمة، شوشمير، هال | Amome, cardamoms | هێل، حێل، رووەکێکە بۆ دەرمانو بەهارات بەکاردێت. |
| شوصة | | ژانەسك، باکردن، برك، کۆڵنج. |
| شوشبة | Ionchaea | (لۆنچە)، مێروویەکە لە مێش دەچێت. |
| شوصر، شصر | Young gazelle | بەچکە ئاسك. |
| شوط | Rid, Run, distance, Object, Aim, Run round, Bout | ماوە، جار، نۆرە، هەنگاو. |
| شوع، بان، سر، يتصر، يسر، يسار، سياع | Been oil tree, Horse radish | موورونچە، درەختێکە گەڵای خڕو وردە، گوڵەکەی بەشێوەی هێشوویەکی بۆنخۆشە، دەنکەکەی رەشو بۆنخۆشە لە نۆك دەچێت، دەکرێت بە تەزبیو ملوانکە بۆ یاری پێکردن، هەروەها رۆنێکی بۆنخۆشی لێ دەردەهێنرێت بۆ دروستکردنی عەتر. |
| شوفان، خرطال، هرطمان، زمير، شيلم | Oats | کالتاس، گەڵابرێش، پەرش، هەرزن، جۆرێکە لە دەغڵودان. |
| شوفان بري | Wild oats | هەرزنە کێویلە. |
| شوف، منساج، بولدوزر، شفل | Shovel, Bulldozer | بیلدۆزەر، شوفڵ، مەکینەیەکە بۆ رێگاوبان کردنەوە. |
| شوق | Desire | ئارەزوو، پەرۆش، هەوەس، دڵخوازی، نیاز، خواست، ئەڵها. |
| شوق، كهرمان أسود | Jet, black amber | شەوە، کارەبای رەش، بەردێکی بە نرخە. |
| شوقال، شقال | Creat Hedge amber | دەوەنێکی پزیشکییە گەڵاو گوڵەکەی بۆنخۆشە. |
| شوقة، غراب الزرع | Jackdaw | قەلەڕەشکەی کێڵگە، قەلی کێڵگە. |
| شوك، شوكة | Thorn, Spine, pricKle, chaite-specule, chaeta,prick, seta, spike | ئەستری، ستری،خار، درك، چقڵ، پەیکول، دڕکێکی گەورە، خیب قونجر. |
| شوك، نبات شوكي | Thistle | رووەکی دڕکاوی، کەرتەش، چاوبازە، پەلۆشە. |

| | | |
|---|---|---|
| شوك العلك ، اشخيصه ادلد، اسد الأرض، قاتل الأسد | Spindle-wort-white, chameleon | درکی بنێشت، شێری زەوی، رووەکێکی درکاوییە رەنگی گەڵاکەی دەگۆڕێت و رووەکەکانی نزیك خۆی دەفەوتێنێت، رەگو تۆوەکەی ژەهرینە. |
| شوك احمر، حرض، اشنان القصارين | Salt-wort, Kali | ئەسپێن گیایەکی دەشتەکییە لە قەراغ ئاودا دەڕوێت سۆدەی شتنی لێ دەردەهێنرێت. |
| شوك الضب، زعاف اقنة | Acanthus | وشترخوار، جۆرە رووەکێکە گەڵاکەی گەورەو گوڵەکەی پەمبەییە. |
| شوك مسكي | Muskthistle | درکی مسك، گیایەکی درکاوییە رەگو قەدو گوڵەکەی بۆنخۆشە. |
| قص قصوان الحقول | Creeping-thistle | کەرتەشی خشۆك، جۆرێکە لە کەرتەشی، خشاوە بەسەر زەویدا. |
| شوك عقرباني، قرصعنة | Field-eryngo | گیایەکی دەشتەکییە گەڵاکەی درکاوییە، گوڵەکەی شینە. |
| شوك فرياس، لسان العنب | Sldnder-thistle | زمانە قۆڕی، گیایەکە گەڵاکەی درکاوییە گوڵەکەی بنەوشەییە. |
| شوك شصي | Hooked thistle angled thistle | درکی قولاپی، درکی قولاپەیی. |
| شوك الجمال، رعي الأبل، حسك عاقول حيض | Thistle camel thistle, syrian bears beech | وشتر خۆرکە، گیایەکی دەشتەکیی گەڵا گەورەی درکاوییە، گوڵەکەی پەمبەییە. |
| شوك ازرق، شوكة زرقاء | Amethyst eryngo, amethystinum | تێسوو، گیایەکی درکاوییە، گەڵاو گوڵەکەی مەیلەو شینە |
| شوكان | | بڕوانە (شکاعە). |
| شوك فضي، شوك عنتر | Silvered-thistle | درکی عەنتەر، درکی زیوی، گیایەکی درکاوییە، گەڵاو قەدەکەی زیوییە. گوڵەکەی بنەوشەییە. |
| شوك الدراج، شمك الدرج، مشط الراعي، شوك الدجاج | Teazle,Teazel, Teasel | شانەی شوان، درکی پۆڕ، جۆرە رووەکێکی سەلك و گەڵاکانی درکاوین، دەهاڕێت و دەکرێت بە ئالیك، هەروەها بۆ لکاندنی قوماشی خوری بەکار دەهێنرێت. |
| شوك العرب، اكاسيا، سنط، قاقيا، شوك الشام | Acacia, acacia farnesiana | درکی عەرەب، دارجەوی ، ئەکاکی. |
| شوك الحليب، شوك الحمير | MilK thistle, milk pea | درکی شیر، درکی کەر، گیایەکی درکاوییە، قەدەکەی شیراوی تیایە، گوڵەکەی بنەوشەییە. |
| شوك النار، زعرورو سينا | Fir thorn, Fire bush, pyracanth | درکی ئاگر، دەوەنێکی درکاوییە بەشێوەی هێشووی سپییە، بەرەکەی بەشێوەی هێشووە لە ترێ دەچێت، بە رەنگی ئەرخەوانیی یان ئاگریی. |
| شوك الغنم | American-jute | درکی مەڕ، جۆرێکە لە توڵەکە بەشێوەی دەوەن بۆ رازاندنەوە بەکاردێت- گرشی ئەمریکی. |
| شوك الصباغين، نبق الصباغين | | درکی رەنگ، ئاوی رەنگ، دەوەنێکی درکاوییە، رەنگی بەرەکەی سوورە، رەنگێکی زەردی لێ دەردەهێنرێت. |
| شوك قرمزي | Crimson thorn | درکە سوورە.دەوەنێکە گوڵی سووری لێ دەردەهێنرێت. |
| شوك القدس، باركنسونيا | Jerusalem thorn Parkinsonia | درکەزیی، درکی قودس، دەوەنێکی درکاوییە بۆ مەبەستی پەرژینی باخچە بەکار دێت.. |
| شوك، خرنوب، شيشلان، بكنكطال، شلشلا | Prosopis | خرنووك، خرنویفك، رووەکێکی درکاوی تەمەن درێژی درکاوییە، رەگەکەی درێژە، لە کێڵگەی کشتوکاڵیدا دەڕوێت، بەرەکەی هێندەی زەیتونێك دەبێت، تاڵە. |
| شوكة مزهرة، جنستا عقربية | Scorpion-troom, Genistascorpius | (جێنیستا)، درکەگوڵدار، رووەکێکە رەنگێکی سەوزی لێ دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شوكي | Thorny, Spiny, Spinal, staceous-acicular, Acanthoid acanthaceous, Bristly, Chaeto | دڕکی، دڕکاوی، شتێك پەیوەندی بە دڕکەوە هەبێت. |
| شوكية الرأس، شائكة الرأس، راسنوكيات | Acantho-cephala | سەر دڕکاوییەکان، کۆمەڵە کرمێکی مشەخۆری سەر دڕکاوین، لە لەشی بەراز،و باڵندە دەژین. |
| شوكية القدم، شوكقدميات | Acantho, pod, Chaetopoda | پێ دۆڕکاوییەکان، کە پێیەکانیان دڕکاوین. |
| شوكية الأصابع | Acanthodactylus | پەنجە دڕکاوییەکان، ئەو گیاندارانەی کە پەنجەکانیان دڕکاوین. |
| شوكي الشكل | Setiform, chaeto,like, spiniform, Chaeto | شێوە دڕکی. |
| شوكة الأكل | Fork | چەتاڵ، چنگاڵ، چلچنگ. |
| شوكة، هلب | Bristle, Chaeta | موویەکی ڕەق، وەکوو مووی بەراز. |
| شوكة رنانة، | Tuning fork | زرنگە چنگاڵ، چوتاڵی زرنگاندنەوە، چەتاڵی زرەنگەدار، شەنی زرنگانەوە، چنگاڵی زرنگانەوە. تاقیکردنەوەی پێ دەکرێت. |
| شوكة الدمن، حخرشف بري، كعيب، كنكر، شوك النصاري، عكوب، كعوب | Milk thistle, Bears-breech, Acanthus mollis | کنگر ، کەنەر، کەنگر، گیایەکی ساڵانەی گەورەی دڕکاوی گەڵا پانە بنکەکەی دەکرێت بە چێشت یان ڕاستەوخۆ دەخورێت. |
| شوكة المسيح، شبهان، شائك | paliurus | زریسك، زریشك، تەڵوك، دەوەنێکی دڕکاوییە لە کرمەڵەی تاوگ مۆرە گوڵێکی زەردی هەیە بۆ پەرژین بەکاردێت، هەندێکی بەرێکی خۆش دەگرێت. |
| شوكة الحائك، حسك النساج | Teasel bur | هەپك، کەرکیت، ئامرازێکە جۆلا تانوپۆی پێ ڕێك دەخات. |
| شوكة باراهيم، قراص | Nettle | گەزنە، بەیبونە کێویلە. |
| شوكة جانبية | Lateral | دڕکی لاتەنیشتی. |
| شوكة مباركة شوك مريم سلبين | Holly thistle, Blessed thistle | دڕکە پیرۆزە، جۆرە گیایەکی دڕکاوییە زەردە، وەکوو کنگر دەخورێت. |
| شوكة العقرب، حمة | Sting of scorpion | چزووی دووپشك. |
| شوكة القنفذ | Quillspine | دڕکی ژیژك. |
| شوكة الجماع | Spenial seta | دڕکی جووتگرتن، وەکوو لە هەندێك مێروودا هەیە. |
| شوكة صفراء ، قرنون | Golden thistle, Scolymus | دڕکە زەردە، گیایەکی دەشتەکییە، گەڵاکەی گەورەیە دڕکی زەردی پێوەیە گوڵەکەی بنەوشەییە، ڕەگەکەی ئەستوور و شیرینە دەخورێت. |
| شوكة الفرج، قيد الشفرين | Fourchet | گرێی قوز، شوێنی بە یەك گەیشتنی دوو لچەکەی قوز. |
| شوكة الفم ، شوكة الفك، فكشوكيات | Chaetogneatha | دەم دڕکاوییەکان، کۆمەڵە گیاندارێکە دڕکی قایەو وا بەسەریانەوە، وەکوو گیانداری ((ساجیتا)) کە بریتییە لە کرمێکی دەریایی. |
| شوكجلديات، شَوكية الجلد، شوكيات | Echinodermata | پێست دڕکاوییەکان، کۆمەڵە گیاندارێکن وەکوو ئەستێرەی دەریاو ژیشکی دەریاو خەیاری دەریا. |
| شوكوليت، شوكلاتة. ـكولاتة | Chocolate | چوکلێت، جۆرێە لە شیرینی لە بەری دارێکی تایبەتی دروست دەکرێت کە لە کاکاو دەچێت، دوای پاککردنو برژاندنی لەگەڵ شەکرو هەندێك مادەی تر تێکەڵاو دەکرێت بەشێوەی قاڵب لە کاغەزەوە دەپێچرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| شوكران البساتين، كرفس بري ، بقدونس كاذب | lesser hemlock, Aethusa | كەرەوز كێویلە، مەعدەنووسە كێویلە، گیایەكە گوڵەكەی لە چەتر دەچێت بۆنی كەرەوزی لێ دێت، ئاوكەكەی ژەهرین و كوشندەیە. |
| شوكران الماء، سيكيوتا السام، قاتل البقر | Water hemlock, Cow-bane, Cicuta- virosa | ژەهرەگا، كاكوڕ، رووەكێكی ژەهرینە گوڵەكەی لەشێوەی چەتر دایە |
| شوكران، طحماء، شيكران، بيسبيس، قونيوم، كونيوم | Poison-hemlock, Herb bennet, Conium | رووەكێكە لە كۆمەڵەی گێزەر، گوڵەكەی لەشێوەی چەتردایە. سپییەو قەدەكەی سەوزە پنكە پنكەی سووری تیایە. توێكڵەكەی بۆ دەباخكردن بەكاردێت، بۆنێكی بۆگەنی لێدێت لە بۆنی مشكدەچێت، مادەیەكی ژەهری سڕكەری لێ دەردەهێترێت پێی دەگوترێت (كونین) یان (كونوسین). جاران دەرخواردی تاوانبارەكانیان دەدا بۆ كوشتنیان |
| شوكرين. كونوسين | Conicin | (كۆنیسین) مادەیەكی ژەهرە لە ناوكی رووەكی [illegible] |
| شوكر. حجل | Chuker | سوێشكە، باڵندەیەكە لە كەو دەچێت، بەڵام بچووكترە |
| شوكل، عليق، عوسج | Bramble, Black, berry | تووترك، دەوەنێكی دەشتەكی و كشتوكاڵییە، لقەكەی دڕكاوییە، بەرەكەی رەش یان سوورە لە توو دەچێت [illegible] یان مەیی لێ دەردەهێنرێت |
| شولة | | بڕوانە (شوكت العقرب). |
| شولة | Meteor | شۆڵە، تیرشهاو، ئەستێرەی كشاو. |
| شولة. الشولة | Shomlzk,Alasha, Scorpii | چزووی، دووپشك، ناوی ئەستێرەیەكە. |
| شولة منقوطة | Semicolon | خاڵ و بۆر، (؛) یەكێكە لە نیشانەكانی وەستان لە نووسیندا |
| شولة، فارزة | Comma, Vibrio | وێرگول، نیشانەی جیاكردنەوەی [illegible] |
| شول، استشالة | Nicking | كلك پێگرتن، بڕینی ماسوولكەی خوارەوەی كلكی ئەسپ بۆ ئەوەی هەر كلكی بە قیتی بوەستێت. |
| شولر | Shoveler | شۆڵەر، مراویەكی رووبارییە. |
| شولة بيضاء، عنجد | Euphorbiumgum- plant | جۆرێكە، لە رووەكی شیرمار، شیراوێكی ژەهریی لێ دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشكی. |
| شولم، شيلم، شالم، سلت | Rye | هەرزن، پەرشت، گیایەكە لە كۆمەڵەی دەغڵودان، دەنكەكەی لە گەنم دەچێت ئاردەكەی مەیلەو رەشە. |
| شوم، شؤم | Bad luck | شووم، رەشینی. |
| شوم | Hickory | جۆرە تەختەیەكی رەقە. دەسكی كەلوپەلی لێ دروست دەكرێت. |
| شوم | Shawm | (شاوم)، ئامرازێكی مۆسیقای كۆنە لە تەختە دروست دەكرێت. |
| شومار | | بڕوانە (شمار، رازیانج). |
| شوندر | | بڕوانە (شمندر). |
| شونيز، شينيز، كمون أسود، حب البركة | Nigella, Black cumen, Fennel flower | زیرەی رەش، رەشكە، سیاوڵە، گیایەكی ساڵانەی جوانە، هەندێكی كێویلەیە، هەندێكیشی لەبەر گوڵ و دەنكەكەی دەروێنرێت، گەڵاكەی دەزوولەییە، بەرەكەی لوولەییە، دەنكەكەی رەش و بۆنخۆشە بەشێوەی بەهاراتی بەكار دەهێنرێت و دەكرێتە نانەوە. |
| شونة، هري، انبار | Granary, Garner, Silo | عەمار، سایلۆ، عەماری خەلە. |
| شونكة | Rolls or loaves of dough | پەپكە، گەنگە هەویر، گرك، بەشی یەك نان هەویر. |

| | | |
|---|---|---|
| شونغ | Chewind | (چوینك)، چۆلەکەیەکی ئەمریکیی بچووکە. |
| شونس | Chionis | ئەستووره، رەنگەکەی سپییە لە قەراغ ئاودا دەژی. |
| شوهار، كزاز | Tetanos | تیتانۆس، دەردەکۆپان، نەخۆشییەکی درمە، نەخۆشەکەی دەمی دادەخرێت. |
| شوهت | Hedgehog | ژیشك، ژیشك،ژوژو. |
| شوهب، شبهم، دلدل، نبض، شيظم | Porcupine | کلکی سیخوری، کلك سپی. |
| شوي، شواء | Roasting | برژاندن. |
| شويكة | Acanthion, Spicula | درکی ورد. |
| شويكول | Chavicol | چافیکۆل، مادەیەکە لە رۆنی گەڵای دەلەبیبەری بیتیلدا هەیە. |
| شويكي- حسون | Gold finch | چۆلەکەیەکی خۆش ئاوازی رەنگینە بە سوورو زەردو سپیو رەیش شینو سەوز تۆوی درکاوی دەخوات. |
| شويسين | Chavicin | (چاڤیسین)، مادەیەکە لە پیپرین دەچێت لە دەلوبیبەردا هەیە. |
| شوبرت، اشعرة، حمري | Wild barley | کەرکۆخینە، کەرخەنوك، جۆکێویلە، جۆرێکە لە جۆ، بەرمەکەی تووکنە. |
| شويل، نبات الشيخ، أم وجع الكبد | Alkali weed, Reptare wort , Burst wort | ئەسپۆن، گیایەکە لە زەوی شۆرەکاندا دەروێت، گوڵەکەی مەیلەو سپییە بەرمەکەی زەردە. |
| شويلاء، شويلة، عبيثرات، حبق الراعي، برنجاسف | Mother wort, Mug wort | رێحانەشوانە، گیایەکە قەدو لقەکەی رەقە، گوڵەکەی تاڵو بۆنخۆشە بۆ مەبەستی پزیشکی دژی کۆڵنج بەکاردێت. |
| شويهين، كونج | Hobby | شاهۆی بچووک، جۆرە باڵندەیەکە. |
| شياع | Brazier | کوانوو، ئاگردان، چاوگەی ئاگر. |
| شياخ | Progeria | زووپیربوون، لە ئەنجامی گەورەبوونی نائاسییەوە. |
| شباط، سمط سفع | Scorch, Scald, Burn slightly | هەڵکروزان، سووتانێکی کەم. |
| شيء | Thing | شت، چشت، شتوومەك. |
| شيئية (للعدساتن) | Objective | زەرەبینیشتەکە، ئەو زەرەبینەی کە لە میکرۆسکۆبدا شتەکەی پێ دەبینرێت. |
| شيئية كبيرة | Highpower objective | زەرەبینی گەورەی شت. وەکوو لە میکرۆسکۆبدا. |
| شيئية صغيرة | low power bojective | زەرەبینی بچووکی شت وەکوو لە میکرۆسکۆبدا. |
| شيال، حمال | Porter, Carrier | حەمال، هەڵگر. |
| شيالة، ذنب الخيل، كنبات، امسوخ | False horse-tail Horse pipe, Bottle brush | کلکە ئەسپ، فلچەی بوتڵ، گیایەکی شوێنە شێدارەکانە رەنگی سووری لێ دەردەهێنرێت. |
| شيب، مشيب | Hoariness, grey hairs | پیری، سەرسپێتی. |
| شيبة، ذقن العجوز | ligneous warm wood | شیلەیەکی ژەهرینی تاڵە لە رووەك دەردەهێنرێت، هەروەها جۆرە درەختێکە. |
| شيب الشعر | Polio Thyrix | سپێتی سەر. |
| شيبة العجوز، حزاز الصخر | Flowering moss, Tree hair | رووەکی قاش قاشی بەرد، گڵە وزەی بەرد، جۆرێکە لە رووەکی قەوزە. |
| شيب، شق المناقع | Chaus | پشیلە کێویی زەلکاو. |
| شيبة، ريحان أبيض، ارطماسيا شجرية. | Artemisia-arborecens | ئەرتمیزیای درەخت، رێحانە سپیکە. |

| | | |
|---|---|---|
| شيف (قماش) | Printed Calico, Cotton print, Chintz | چیت، قوماشێکی لۆکەی ڕەنگاو ڕەنگە. |
| شبه (وشي) | Blemish | نەنگی، عەیب کەموکوڕی. |
| شبح، سانمتولينا، ارطماسيا، عبيثرات، بحتران، قيصوم | Artemisia, Worm wood, suntonica, Herbaceous-absinth, Lavender cotton | (سانتۆنیا)، ڕێحانە کێویلە، بۆنخۆشکە، گیایەکی تەمەن درێژی هەمیشە سەوزە نزیکەی نیو مەتر بەرزدەبێتەوە لق و گەڵاکەی خوڵەمێشییە بۆنێکی خۆش و بەتینی هەیە، گوڵەکەی سەوزی مەیلەو زەردە، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردەهێنرێت، دەرمانی ژانە سک و کرم فڕێدانی لێ دەردەهێنرێت، هەروەها ڕۆنێکی سەوزی تیژی لێ دەردەهێنرێت ، لە دروستکردنی مەیی (ڤێرمۆن) دا بەکاردێت. |
| شبح شجري، تم | Spanish-broom | (سانتۆلیای درەخت)، دەوەنێکی دەشتەکییە گوڵەکەی زەردو بۆنخۆشە بۆ ڕازاندنەوە بەکاردێت. |
| شبح رومي، دمسيسة ، ابسنت، فسنتين، خترق | Absinthium, Roman worm absinth | بۆنخۆشەکەی ڕۆمی ، گیایەکە قەدەکەی توکنە، گەڵاکەی تاڵە، گوڵەکەی بەشێوەی هێشووی زەردە ، ڕۆنێکی سەوزی تیژی لێ دەگیرێت، بۆ دروستکردنی مەی (ڤێرمۆت)و دەرمان بەکاردێت.شیخ |
| شيخ | Old man | تەمەندرێژ،پیر، پیرەمێرد، تەمەنی لە پەنجا ساڵ زیاتر بێت. |
| شيخوشة | Oldage, senility, Senescence, Decrepitude- senile, Nanism | بە ساڵاچوون، تەمەنە درێژی، کاڵبوون، بەناواچوون، پیری. |
| شيخوشة مبكرة، شياخ | Geromorphism | زوو پیربوون، پیریی، پێش وەخت. |
| شيخية، شيخة، اريخارون، شيخ الربيع | Erigeron, Flea- bane, Rag wart | شێخە بەهارە، گوڵێکەزار، جۆرە ڕووەکێکە لەناو کێڵگەکاندا دەڕوێت، هەروەها بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە بەکاردێت. |
| شيخة، زهرة الشيخ | Senecio, rag wart, Rag wort | گوڵە شێخانە، ڕووەکێکە شتێکی پێوەیە لە کڵاوی سپی دەچێت. |
| شيخ البحر، ابو مريئة، عجل البحر، فقمة | Seal, phoca | شێخی دەریا،گوێرەکەی، دەریا، گیاندارێکی شیردەری دەریایی‌یە سوود لە پێست و چەوری‌یەکەی وەردەگیرێت. |
| شيروت | Cheroot | (چرووت)، جۆرێکە لە جگەرە. |
| شيرج، سيرج | Sesameall | ڕۆنی کونجی. |
| شيرة | Golden syrup | شیلە، دۆشاوی شەکر. |
| شيراز | | بڕوانە (شرش). |
| شيز | Chaise | (شێز)، جۆرە گالیسکەیەکی سووکەڵەیە دوو یان چوار پێچکەی هەیە. |
| شيزوفيرينيا، عصام، انشطار الشخصية | Schizophrenia | (شیزۆفیرینیا)، پارچە پارچەبوونی فەرمانەکانی مێشك جۆرێکە لە شێتی، نەخۆشی‌یەکی دەروونی‌یە، ئەو کەسە دوو شەخسیەتی دەبێت. |
| شيزلنغ | Chaise longue | (شیزلۆنگ)، جۆرە کورسی‌یەکی درێژە. |
| شيزي، عرعر | Juniper | عەرعەر، وەهەل، هەورێس، هەڤرێسك، هاڤرێسك، هێڤەر، سەروو کێویلە، درەختێکە لە کۆمەڵەی سەروو، گەڵاکەی وەکوو دەرزی وایە، بەرەکەی لە تری دەچێت شیرین و بۆنخۆشە، دەرمانی بەهێزکردنی پیاوەتی لێ دەردەهێنرێت، تەختەکەی ڕەقە، ئاوکەکەی زەمقییە. |
| شيزونت | Schizont | (بارێکە)، (شێوازێکە) لە ژیانی هەندێك گیانداری سەرەتایی وەکوو پلاسودیۆم. |
| شيست | Schist | (شیست)، بەردێکی بورکانی‌یەبەشێوەی توێژاڵ هەیە مادەی میکاوتاڵکی تیادایە. |

| | | |
|---|---|---|
| **شيسليت** | Chessylite, azurite | (شيسليت)، يەكێكە لە كەرەستە خاوەكانى مس، رەنگەكەى شينى تۆخە نيشتبيە لە كاربۆناتى مس تفته |
| **شيشة التدخين، ارجيلة** | Hubble-bubble, Narghile | سەرگەلە. ئامرازێكە بۆ توتن جگەرە كێشان. |
| **شيشي، سفود، مغول، سيف الوغز** | Foil, Broach | شيش |
| **شيشلان، خرنوب المعزى** | Prosopis-stephaniana | خرنووكى بزن. رووەكێكى تەمەن درێژى دڕكاوييە، رەگەكەى درێژە بە رەحمەت هەلدەكێشرێت. لە هەندێك زەوى كشتوكاڵيدا دەڕوێت |
| **شيصبان** | Ant(male) | نێر ميرووله |
| **شبط** | Scald | سەرمابردن. سەرمابردنى رووەك، شەڵتە. |
| **شيطان** | Satan, Devil | ئەهريمەن، شەيتان. |
| **شيطان البحر** | Devil fish | ديوەماسى، شەيتانى دەريا. شەيتانەماسى. گيانلەبەرێكە لە كۆمەڵەى ماسى، كلكێكى درێژى هەيە. لە ماسيە پانكە دەچێت |
| **شيطرج، عصاب، مسواك الراعي** | Dittender | سيواكى شوان. گيايەكە گوڵەكەى سپى يان زەردە بەرەكەى لە بەرى خەرتەلە دەچێت |
| **شيظم. شيهم** | Porcupine | سيخوڕ. سوجەر. گياندارێكى شيردەرى قرتێنەرە لەشى بە دڕك داپۆشراوە. لە كاتى مەترسيدا دڕكەكەى دەگرێتە دوژمن |
| **شبع** | Young lion | بەچكەشێر |
| **شيف** | Siice | قاش، كووز. |
| **شيف** | Air tight | كونبڕ، هەوابڕ. |
| **شيفون** | Chiffon | (شيفۆن)، قوماشێكى ئاوريشمى تەنكە. |
| **شبق. مرينة، ابو مرينة** | Moray,Muraena | (مۆراى)، جۆرە ماسييەكە لە مارماسيى دەچێت. |
| **شبقة. اوز مصري** | Chenalopex, Egyptian goose | قازى ميسرى. جۆرێكە لە باڵندەى قاز |
| **شيك انيق** | Chic | شيك، قۆز، ديمەن جوان |
| **شيكو، بن كنتكي** | Chicot Kentucky coffee beau | (چيكۆت)، جۆرە تۆوێكە لە جياتى قاوە بەكاردێت. |
| **شيك صك** | Cheque | چەك، چەكى پارە. |
| **شيكولاته** | | بڕوانە(شوكوليت). |
| **شيكارة** | | بڕوانە (شوايه مشواه). |
| **شيكوريا، لعاعة** | Chicory,Endive | كاسنى، گيايەكە، دەكرێتە زەڵاتەوە، تۆوەكەى بۆ مەبەستى پزيشكى بەكاردێت، لە هەندێك شوێن پێى دەڵێن كاردو. |
| **شيلك** | | بڕوانە (شليك)، فراوله). |
| **شيلاك. صمغ اللك** | Shellak, Shellac | شيلاك، لۆك، دەمەلۆك، جۆرە ڕێسينێكى (جەويى) سروشتييە لە لايەن جۆرە مێرووييەكەوە دەردەدرێت، لە ئەلكهولدا دەتوێتەوە، لە دروستكردنى بۆيە (وەرنيش)و مادەى لكێنەردا بەكاردێت. |
| **شيليت** | Sheelite | (شيليت)، كەرەسەيەكى خاوى تەنگستنە. بەردێكى بە نرخە بە شێوەى كريستاڵ، كالسيۆمو كانزاى ولفرامو ئۆكسجينى تيايە لەگەڵ گرافيتدا هەيە. |

| | | |
|---|---|---|
| شيلم، سلم، شولم | Darnel, Ryegrass, common rye | جۆ رەشە، پەڕشت، هەرزن. |
| شيلم بري | False oat- grass, french rye- grass | هەرزنە کێویلە، گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵودان زیانبەخشە بە دەغڵودان. |
| شيلو | Chilo | (چیلۆ)، مێرووییەکی بچووکی زیانبەخشە بە رووەك. |
| شيميات | Carangidae | (کارانجیدا)، کۆمەڵە ماسییی‌کی پەڕەکەدارو دڕکاوییە. |
| شيم، صيم | Caranx | (کارانکس)، جۆرە ماسییەکی دەریایی‌یە. |
| شيمية الماء، دردور | Whirl pool, Vortex | گەرداو، گکەردولوولی. |
| شينو | Chino | (چینۆ)، قوماشێکی خاکییە، جلی سەربازیی لێ دروست دەکرێت |
| شينةك | Chinook | (شینووك)، جۆرێکە لە بای باکووری خۆرئاوایی. |
| شينيز | | بڕوانە (شونیز). |
| شيهم، نيص، دلدل، شوهب، مذاع | Porcupine | سیخوڕ، سوچەر. |
| شيهم الماء، قنفذ الماء، سفور | Sea-hedgehog, pricKly globe fish | ژیشکی ئاویی، ماسییەکی خڕی دڕکاوی‌یە. |
| شيوط، سيكوم | chayote | (چایوت)، جۆرە سەوزەیەکە لە کۆمەڵەی کولەکە |
| شيواو | Chihuahua | (چیواوا) جۆرە سەگێکی زۆر بچووکە. |

| | | |
|---|---|---|
| صائد- صياد | Hunter | راوکەر، راوچی. |
| صائد الذباب | Butter wort Fly catcher | مێشگر، ڕووەکێکە لە زەلکاودا دەژی، گەڵایەکی قوپاوی هەیە، شلەیەکی لینج دەردەدات مێش و مەگەزی پێوە دەنووسێت، پاشان خۆی بە دەوریاندا لوول دەدات و هەرسیان دەکات. |
| صائد المحار، أكل المحار | Oyster Catcher | لەپکەخۆر، سەدەفخۆر، باڵندەیەکگی دەریایی‌یە، هێندەی کۆترێك دەبێت و دەنووکێکی درێژو پانی هەیە، لەپکەکەی پێدەکاتەوەو گیانەوەرەکەی ناوی دەخوات. |
| صائد الأرق | Hippodamia | مێشی گەزۆخۆر، جۆرێکە لە خاڵخاڵۆکە سوود بەخشەو مێش گەزۆی زیانبەخش دەخوات. |
| صائد الطير | Birder | راوکەری باڵندە، راوچی باڵندە. |
| صائد السمك قرلي، قاوند، رفرار مازور | King fisher | شاماسی گر، باڵندەیەکە دەچێتە ژێر ئاوو ماسی راو دەکات و دەیخوات |
| صائد الذباب | Fly catcher,Tyrant | مەلەمێشخۆرە، باڵندەی مێشخۆر، باڵندەیەکە بە ئاسمانەوە مێروو دەخوات و هێلانە لە کونی درەختدا دەکات. |
| صاءة | After birth | ئەو شتە پیسەیە کە لە شەرمگەی ئاژەڵی مێوە دێتە دەرەوە دوای بێچووبوون. |
| صئبان، صؤابة | Nit | رشك، گەرای ئەسپێ. |
| صائم | Fasting jejunum | ١- بەرۆژوو ٢- بەشی ناوەڕاست لە ریخۆڵە باریکە، بەزۆر بەتاڵە چونکە خواردنەکەی تێدا ناوەستێت. |
| صائرة ثن | Hay | کا، پووش. |
| صئصئة | Spur | جقەی کەلەشێر، پەنجەی دواوەی قاچی کەلەشێر |
| صائغ الفضة | Silver smith | زیوگەر، زەرەنگەری زیو. |
| صائغ الحلي، صائغ الذهب | Gold smith, jeweller | زەرەنگەر، زێرینگەر. |
| صائن، غشاء حام | Tutamen | پەردەی پارێزەر، وەکوو پەردەکانی مێشك. |
| صابة | Manchineel-tree | درەختی شیرمار، درەختێکە شیراوێکی توونی ژەهر دەردەدات بەرەکەی لە سێو دەچێت و دەخورێت |
| صابورة، ثقل موازنة، صابورة المركب | Ballast | پارسەنگ، قورسایی‌یەك بۆ هاوسەنگگرتن. |
| صابون | Soap | سابون بریتی‌یە لە خوێی ترشە چەورەکان، وەکوو ترشی سیتریەو پالمیتیك، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لە چەوری و قلیە (سۆدیۆم هایدرۆکسید) دروست دەکرێت و بە کوڵاندن بۆ مەبەستی پاککردنەوە بەکاردەهێنرێت، گەلێك جۆرو رەنگی هەیە. |
| صابون التجميل، قرص الصابون | Cosmatic soap | دیمەشۆرە، سابوونی دەموچاو شووتن. |
| صابون صلب (جامد) | Hard (soda) soap | سابوونی رەق. |
| صابون الوغف، صابون الرغوة | Foam soap | سابوونی سەرکەف. |
| صابون سائل | Soft (potash) soap | سابوونی شل. |
| صابون الألمنيوم | Aiuminum soap | سابوونی ئەلەمنیۆم. |
| صابون شحمي | Fat soap | سابونی بەزی. |

| | | |
|---|---|---|
| صابون طبي | Medicatus soap, Medical soap | سابونی پزیشکی جۆرە سابونێکە دەرمانی تێدایە. |
| صابونية، عرق الحلاوة، جذور الصابوناريا | Soaponaria soap wort, soap plant, Hedge pink, | گیا سابوون، ئەسپۆن، جۆرە رومکێکە کە لە کۆمەڵەی مێخەکە، گەڵاکەی گەورەیەو گوڵەکەی پەمبەیی و بۆنخۆشە، جاران قەدو رەگەکەیان بۆ شتنی ئاوریشمو خوری بەکار دەهێنا، چونکە وەکوو سابون کەف دەکات. |
| صابونيات | Sapindaceae | سابوونییەکان - کۆمەڵە درەختێکە وەکوو دارسابوونو کەستانەی ولاخ. |
| صابون شفاف صابون التواليت | Toilet soap | سابوونی توالێت، سابوونی رازاندنەوە، جۆرە سابوونێکی بۆنخۆش و رەنگاو رەنگە. |
| سابون الركبة، داغصة | Knee-cap. patella | کلاوی ئەژنۆ. کەشکە ئەژنۆ. |
| صابون الطين، بيلون صابون صخري | Ciay soap. rock soap, Steatite | سابوونی کەفری. جۆرێکە لە بۆدرە دیمەنەکەی چەورە. |
| صابون رخو، صابون الحلاقة | Soft soap | سابوونی ریش تاشین. لەجیاتی سۆدەی داخکەر بۆتاسی داخکەری تێدا بەکاردیت |
| صابون اخضر | Green soap. Soap-viridis | سابوونی سەوز. بۆ چاککردنی نەخۆشی پێست بەکاردێت |
| صابون قشتالي | Castile soap | سابوونی کاستایل، جۆرە سابوونێکی رەقە لە رۆنی زەیتون دروست دەکرێت لە ئیسپانیا. |
| صابون الزجادين، ثاني اوكسيد المغنيز الطبيعي | | سابوونی شووشەگەرەکان. دووەم ئۆکسیدی مەنگەنیزی سروشتی. |
| صابون كربول | | سابوونی کاربۆل، جۆرە سابوونێکە رۆنی قەترانی تێدەکرێت. |
| صابونين | Saponin | (سابوون ( سابونێن)، مادەیەکی سابوونییە لە رووەکی گیا سابوون یان دارە سابوون دەردەهێنرێت بۆ شتن بەکاردێت. |
| صابونيت | Bowlingite, saponite | (سابوونێت)، کەرەستەیەکی خاوە، بریتییە لە سلیکاتی مەگنیسیۆمو ئەلەمنیۆمو ، بەشێوەی تۆپەڵی سابوونی نەرم لەناو کەڤرە ئاگرینەکاندا هەیە. |
| صابوغة، شابل | Shad, Roach, Nile shad, Clupea, pilchard | (شاد)، جۆرە ماسییەکی گەورەی دڕکاوییە بە ئاسانی راو دەگرێت |
| صابئة | South west wind | بای باشووری خۆرئاوایی، بایەکە لەنێوان باشوورو خۆرئاواوە هەڵدەکات. |
| صاج، طابق | Bread grill | ساجی نان سێر، ساج، سێڵ. |
| صاج | Sheet of iron | لەوحی ئاسن، لەوحی چینکۆ. |
| صاج مموج | Corrugated iron | ئاسنی شەپۆلدار، لەوح و چینکۆی شەپۆلدار. |
| صاحة | Fallow land | زەوی دێم. |
| صاحب، رفيق | Friend | برادەر، هەڤاڵ. |
| صاحب | Owner, possesser of | خاوەن. |
| صاحب صنعة | Working class, Maker | پیشەگەر. |
| صاحب العز، ممسك الأعنة | Auriga | شوانی بزن، بزنەوان، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| صاحب البراءة، صاحب الأمتياز | Patentee | خاوەنی پاکانە،خاوەنی ماف، وەکوو ئەو کەسانەی کە شتوومەکی وەکوو ئامارزوو مەکینەو هتد ، دادەهێنن. |
| صادر | Efferent | دەرکراو، هەناردوو رۆیشتوو. |
| صادرات (تجارة ) | Exports | ئەو کالایەی لە ولاتێکەوە دەنێردرێت بۆ ولاتێکی تر. |
| صادية | | بڕوانە (سادیە). |

| | | |
|---|---|---|
| صاخة، ورم عظمي | Osteoma, Contussion of bone | ئاوسانی ئێسك، گرێی ئێسك. |
| صادات الريح، مصدات الريح | Wind screen | پەرژینی درەخت بۆ پارێزگاریی باخ و بیستان، لە رەشەبا. |
| صادق الخنوثة | True hermaph-rodite | نێرەمووکی راستەقینە. |
| صاد الماء | Water-repellent | دژی ئاو، هەرشتێك بەرهەڵستی ئاوو شێ بکات. |
| صاروج | Piaster, Gypsum | گەچ، قسڵ، گەچاو. |
| صارخة | Shunt | (شەنت)، دابەشکەری تەوژمی کارەبا، تەلێکە هەندێك تەوژمی کارەبایی بۆ دەچێت بۆ گزو لاوازکردنی ئەو تەوژمە. |
| صارية (صارية المركب) | Mast | دووش، تێلا، سالوس، چەلاگ، قەلانگە. |
| صارية، دقل | The mast | (تێلا) کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| صارۆية العلم | Flag staff | دار ئالا، دار بەپداخ. |
| صاروخ ، سهم ناري | SKy- rocket | فیشەکەشێتە. |
| صاروخ | Rocket | (رۆکێت)، ساروخ، قیژەك، موشەك،ئامرازێکە مادەی سووتەمەنیی تیادایە لە دواوە شوێنێکی هەیە بۆ ئەوەی دوکەڵەکەی لێ بچێتە دەرەوە پێشەکەی قورساییەکی پێوەیە، کاتێکە سووتەمەنییەکەی دەسوتێ، دووکەڵەکەی لە پشتەوە دەچێتە دەرەوە ، ساروخەکە بەرەو پێشەوە هەڵدەپەڕێت ، جاری وا هەیە بەهۆی رادارەوە ئاراستە دەکرێت سووتەمەنیی ساروخی تازە شلەیە وەکوو ئەلکهول ئۆکسجینی شلە. |
| صاروخ الأستكشاف، صاروخ السبر | Exploration rocket, Sounding rockrt | ساروخی پشکنین، بۆ زانینی لایەنەکانی کەش. |
| صاروخ طائرة | Aricraft rocket | ساروخی فڕۆکە. |
| صاروخ مداري | Orbital rocket | ساروخی خولگەیی، ساروخی سوڕگەی . |
| صاروخ مراحلي | Multi-stage rocket | ساروخی بە قۆناخ. |
| صاروخ مؤازر | Booster rocket | رۆکێتی یارمەتیدەر، رۆکێتێکی ناوەنجییە، یارمەتیی دەرپەڕینی رۆکێتێکی گەورەتر دەدات. |
| صاروخ مضاد، صاروخ العودة | Rotero rocket | رۆکێتی دژ، رۆکێتی گەڕانەوە، جۆرە رۆکێتێکە لە کەپسولی مانگی دەستکرددا دادەمەزرێت و بۆ کەمکردنەوەی خێرایییەکەی بۆ ئەوەی کە دووبارە بگەڕێتەوە بۆ بەرگە هەواییەکەی دەوری زەوی. |
| صارم | Sharp, Acute, Violent | توندو تیژ، یەکلا. |
| صاص | Sauce | سۆز، سۆس،جۆرێکە لە زەلاتە. |
| صاصل، اشراس، صوصلاء، لبن الطير | Orinthogalum, lady,star of Bethlehem | جافیلۆکە، گیاخە، شیری باڵندە،رووەکێکە لە باخچەکاندا دەروێنرێت بۆ رازاندنەوەی سەلکەدارە، لە کۆمەڵەی شلێرە، نێرکەکەی پووچە،گەلاکەی درێژو وشکە، گوڵەکەی بەشێوەی هێشووە سپی یان سەوز یان زەردە ئەم رووەکە سرێشی لێ دەردەهێنرێت. |
| صاصاة، تساقط الأزهار | Blossom drop | وەرینی گوڵ بەر لەوەی ئاوس بووبێت. |
| صاع، مكيال | Measure of capacacity | پێوانە، ربە کەوچ. |
| صاعد | Ascending | سەرکەوتوو، هەرشتێك بەرەو سەرەوە بڕوات. |
| صاعدة، صواعد | Stalagmite | (ستالاگمایت) مادەی کالسیۆم کاربۆنیت بەشێوەی چلورە لە زەوی ئەشکەوتەکاندا پەیدا دەبێت بەرەو سەرەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| صُفير - ياقوت ازرق | Sapphire | ياقووتی شین، بەردێكی بە نرخی شینە، ئێستا لە تواندنەوەی مادەی ئەلۆمینا دروست دەكرێت. |
| صفير الحية | Tohiss (snake) | فیشكە، دەنگ و فیشكانی مار. |
| صفير الأذان | To tingle = buzz | زرنگانەوەی گوێچكە. |
| صفيراء | Sophora | درەختی دڵداری، درەختێكی جوانە لە كۆمەڵە تاوك، گەڵاكانی نەوەرێت، نزیكەی ٢٥ مەتر بەرز دەبێتەوە، گوڵەكەی سپیی مەیلەو زەردە و بە هێشوو شۆڕدەبێتەوە، بەرەكەی لە بەری فاسۆلیا دەچێت، بۆ ڕازاندنەوەی باخچە و شەقامەكان بەكاردێت. |
| صفيراء يابانية | Japanese- sphora = pagoda tree | درەختی دڵداریی جاپانی. |
| صُفّير - عدن - فرجس - صفريج | Adenia- venenata | (ئەدینیا)، جۆرە ڕووەكێكی ژەهرینە لە كۆمەڵەی ژاڵەیە، لە وڵاتە گەرمەكاندا دەڕوێت، گوڵەكەی مەیلەو زەردە. |
| صفيحة الميكا = صفائح الميكا | Mica book | پەڕەی میكا، بلوورێكی میكایە بە ئاسانی پەڕەی تەنكی نەرمی لێ جیادەكرێتەوە. |
| صفيحة دموية - قرص دموي | | بڕوانە (صفائح دمويه). |
| صفيحة شرجية | Anal plate | پەڕەی كۆمی. |
| صفيق = سميك | Thick | ئەستوور. |
| صفينة - ابهل - ابق | Sabin = savin | هەڤریسك، عەرعەر، درەختێكە لە كۆمەڵەی سنەوبەر، ڕۆنێكی لێدەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| صقاع - صقيع الديك - صياح الديك | Cry of cock = crow | خوێندنی كەڵەشێر. |
| صقار - مدرب الصقور | Hawker | هەڵۆدار، بازدار، ئەو كەسەكەی كە باز و هەڵۆ پەروەردە دەكات و ڕاویان پێدەكات. |
| صقاع - قناع الغازات السامة | Gas- mask | كلێتە گازە ژەهرەكان، دەمامك. |
| صقالة - مصقلة | Burnisher | مشت وماڵدەر، سافكەر، ئامرازی سافكردن، ماڵە. |
| صقب | Cry of birds | دەنگی مەل. |
| صقر | Falcon = hawk | هەڵۆ، باڵندەیەكی دڕندەیە، گۆشتی گیانەوەری لە خۆی بچووكتر دەخوات، نووكی باڵەكەی تیژە، لاقەكانی زۆر بەهێز نین. |
| صقر اسود - صقر رمادي | Buteonine = black hawk = buzzard = crab hawk | هەڵۆی ڕەش. |
| صقر العنكبوت - علاّم | Spider- hawk = accipeternisus | هەڵۆی جاڵجاڵۆكە، هەڵۆی جاڵجاڵۆكە خۆر. |
| صقر الحشائش | Bush hawk | هەڵۆی گژوگیا. |
| صقر البط - سوذق | Marsh harrier = duck hawk = peregrine falcon | هەڵۆی مراوی. |
| صقر السمك | Fish hawk osprey = mullet hawk | هەڵۆی ماسی، هەڵۆی ماسی خۆر. |
| صقر الأوز | Goose hawk = goose hawk | هەڵۆی قاز، باز، هەڵۆی قاز خۆر. |
| صقر احمر | Red hawk | هەڵۆی سوور. |
| صقر صغير - يؤيؤ | Merlin- falconet | ئاخابۆك، جۆرە هەڵۆیەكی بچووكە. |

| | | |
|---|---|---|
| صقر - اجدل - جدل - قطامي | Hawk = saker = falcon = tercel | هەڵۆ، سیمسانگ، تەوار، باڵەبان، باڵەوان، ئاغەجە، باشۆك، شاباز، چەرخ، باڵندەیەکە گۆشتی زیندەوەر دەخوات، سەری پەڕی پێوەیە و دەنووکی کورت و قولاپییە. |
| صقر العصافير - بيدق - طوط - باشق - علاّم | Bastard hawk = sparrow hawk = accipiter = killy hawk = accipiterine | واشە، واشەی چۆلەکەخۆر. |
| صقر صائد الحيات = طير الكاتب | Secretary bird | باڵندەی نووسەر، باڵندەیەکی جوانە، قاچ و دەنووکی درێژە، مارو مێروو دەخوات. |
| صقر الحمام | Pigeon hawk = merlin | هەڵۆی کۆتر، جۆرێکە لە هەڵۆ ڕاوی کۆتر دەکات. |
| صقر العسل | Honey buzzard | هەڵۆی هەنگوین، هەڵۆی هەنگوینخۆر. |
| صقر الكركار | Caracara = carrion falcon | (کاراکارا) هەڵۆیەکە لە باشووری ئەمریکا دەژی، لاشەی مردوو دەخوات. |
| صقر حمر الارجل | Redfooted falcon | هەڵۆی لاق سوور. |
| صقر الغابة | Forest falcon | هەڵۆی دارستان. |
| صقر القطب الشمالي = سنقر = سقر شاهر طويل الساق | Gerfalcon, gyrfalcon | شمقار، هەڵۆیەکی زۆر بەهێزە لە ناوچەی پۆڵی باکووری دەژی. |
| صقر صغير | Hobby falcon | هەڵۆی بچووك |
| صقر الحُرّ | Lanner falcon | لاشیە هەڵۆی شایەن |
| صقر الطويل الذنب | Long- tailed hawk | هەڵۆی کلك درێژ |
| صقر قصير الذنب | Short- tailed hawk | هەڵۆی کلك کورت |
| صقر احمر الذنب | Red- tailed hawk | هەڵۆی کلك سوور |
| صقر ابيض الذنب | White- tailed hawk | هەڵۆی کلك سپی |
| صقر ابيض | White hawk = buteonine | هەڵۆی سپی |
| صقر الليل - صقر البعوض | Mosquito hawk = night hawk | هەڵۆی مسووڵە هەڵۆی شێوەکی |
| صقر حَوام - عقيب مرزة - سقاوة شائعة | Common buzzard = buteo vulgaris = montagns harrier buzzanol | هەڵۆی ئاسایی. ڕەنگەکەی خۆڵەمێشییە. |
| صقر الأرنب | Spotted eagle = rough- footed | هەڵۆی کەروێشك، گیاندارێکی بە سوودە چونکە گیاندارە قرتێنەر و خشۆکەکان دەخوات. |
| صقري العين | Hawk- eyed | چاو هەڵۆ - چاوتیژ، کەسێك چاوی تیژ بێت. |
| صقر العجم | Oriental falcon | هەڵۆی عەجەمی، هەڵۆی خۆرهەڵاتی باڵندەیەکی دڕندەیە. |
| صقر الغزال = شرق | Saker falcon = falcon cherrug | هەڵۆی ئاسمخۆر، هەڵۆیەکی جوانە. |
| صقر جرّاح | Buteo, buse | بڕوانە (سقاوە). |
| صقر الفئران - مرزة الدجاج | Hen- harrier = chicken hawk | هەڵۆی مریشك، هەڵۆی مشك. |
| صقر الخفاش | Bat falcon | هەڵۆی شەمشەمە کوێرە خۆر. |
| صقر المروج | Falcon mexicanus = prairie falcon | هەڵۆی مێرگ، هەڵۆی مەکسیکی، جۆرە هەڵۆیەکە لە مەکسیك دەژی چۆلەکە و مێروو دەخوات. |

| | | |
|---|---|---|
| صقر الجراد - يؤيؤ - عويسق - ابو رياح - جلم | Kestrel | هەڵۆی کوللە، کوللە خۆر، جۆرێکە لە هەڵۆ دەنووکەکەی شینی کاڵە، قاچی زەرد و نینۆکەکانی ڕەشن. |
| صقر آكل الحيات - اكبد - اشـبور - قوقش | Milvago | هەڵۆی مارخۆر، جۆرە باڵندەیەکی گۆشتخۆرە ڕەنگەکەی مەیلەو سوورە، هێڵی سپی و بۆری تیایە لەسەر لاشەو مارو مێروو دەژی. |
| صقر باز - شاه باز - صقر شاهين - نقيل | Peregrine = shahin falcon | شاباز، جۆرە بازێکە سەرەکەی خڕە و چاوی سوورە، لاقی زەردە، پشتی قاوەیی مەیلەو سوورە، سنگی سپییە، دڕندەو تێرنەخۆرە. |
| صقراب - جرومة | Trumpet tree = snake wood tree | دارمار، دار زوڕنا، درەختێکە تەختەکەی سپی و سووک و بە نرخە. |
| صقل | Polishing = burnishing = smoothing | لووسکردن، زاخاودانەوە، پەرداخکردن، سافکردن. |
| صقلابيات | Asclepias = milk weeds | کۆمەڵە ڕووەکێکە دار و دەوەن و گیا دەگرێتەوە. بەرەکانیان جۆرە موویەکی پێوەیە لە ئاوریشم دەچێت. |
| صقل الأقمشة | Gloss | سافکردنی قوماش. |
| صقلاب مدمي - زهرة الدم | Blood flower | گوڵە خوێن، دەوەنێکە گوڵەکەی پەمبەیی یان سوورە. |
| صقلاب سوري - شجرة الحرير | Silk cotton = wild cotton = silk weed | دار ئاوریشم، درەختی ئاوریشم، دەوەنێکە گوڵەکەی زەردی مەیلەو سەوزە. بەرەکەی هێلکەی ڕەنگ فستقییە، ڕیشاڵی ئاوریشمی پێوەیە، تۆوەکەی ورد و ڕەشە. |
| صقلاب عسقولي = حشيشي ذات الجنب | Butterfly weed = tuber root | گیا سینەپاڵوو، دەوەنێکی سەلکدارە. گوڵەکەی پرتەقاڵیی مەیلەو زەردە مادەیەکی پزیشکی لە سەلکەکانی دەردەهێنرێت، دەڵێن گوایا بۆ چارەکردنی نەخۆشیی سینەپاڵوو بەکاردێت. |
| صقيع | Frost | شەختە، زوقم، سیخوار، خیسار، خوسار، وەیشوومە. بەخ، جەق، خووس، بەستنی شەونم لە کاتی ساردبوونی کەشدا. |
| صقيل - لامع | Burnished = glazed = glossy = shining | ساف، لووس. |
| صك - شيك - مستند | Chaque = document | چەك (چەکی پارە)، ڕەسیید، قۆچان، قاقنی. |
| صك التمليك، سند الملكية | Title deed | چەکی (ڕەسییدەی) موڵکداری. |
| صكك - صدف | Knock- knees = tragopodia | خواربوونی هەر دوو قاچ بۆ ناوەوە بە جۆرێکی ئەوتۆ کە هەردوو ئەژنۆ لەیەکتری نزیك ببنەوە. |
| صلابة - صلادة | Hardness = rigidity = solidity | پتەویی، ڕەقیی، سەختیی، بەرگریکردنی بەرد بۆ ڕووشاندن و بڕینەوە، بەرێگەی تایبەتی دەدۆزرێتەوە. |
| صلابة للحشرات | Spreader | تەڵەی مێروو، ئامرازێکە بۆ گرتن و ووشککردنەوەی مێروو. |
| صلام | Kernel | کرۆکی ناوك، کرۆکی دەنك، وەکو کرۆکی دەنکە چەقاڵە کە سوێر دەکرێت. |
| صلاح - جودة | Goodness | چاکی، باشی. |
| صلاصل | Sistrum | (سیستریم)، ئامرازێکی مۆسیقای کۆنە خشەخشی لێوە دێت، جاران بەکاردەهێنرا. |
| صلاية - هاون - مدق | Mortar = palette | دەسکەوان، دەسکەوانێکە لە بەرد دروستکراوە، جاران بۆ کل هاڕین یان داستان لەسەر نووسین بەکاریان دەهێنا. |
| صلب - شنق | Hanging | لە قەنارەدان، لە سێدارەدان. |
| صلب | Hard = solid | ڕەق، سەخت، سەرت. |

| | | |
|---|---|---|
| | Thermo setting | بە گەرمی ڕەق، هەر مادەیەکی ڕەق بە گەرمی شی ببێتەوە بەر لەوەی کە نەرم ببێتەوە وەکو پلاستیك. |
| صُلب - عمود الفقري | Backbone | مورەغەی پشت، تیرەغەی پشت. |
| صُلب - فولاذ | Steel | پۆلا، دارشتەیەکە لە ئاسن و کانزای تر. |
| صلبانية - حشيشة الصليب | Cross wort | گیاچاخ، گیایەکە گوڵەکەی پەمبەییە بۆنی سیری لێدێت بۆ مەبەستی پزیشکی، بۆ دروستکردنی دەرمانی هەرسکردن بەکاردێت. |
| صلبة العين - بياض العين | Sclerotic = coat = sclera | بەزی چاو، سپێنەی چاو، چینە سپییەکەی دەرەوەی گلێنەی چاو. |
| صلبة الفم | Sclerostoma | دەمڕەقەکان، جۆرە کرمێکی دەزوولەییە و هەندێکی بە شێوەی مشەخۆر لە لەشی گیاندارە ماڵییەکاندا دەژی.. هەندێکیشی لە ڕیخۆڵە باریکەی مرۆڤدا. |
| صلة (اتصال)، صلة القربى | Relation | پێوەندی، پەیوەستی، پەیوەندیی خزمایەتی. |
| صلجة - شرنقة - فيلجة | Cocoon | قۆزاخە، قۆزاخەی مێروو، پەردەیەکی ئاوریشم تویـد داخـراوە، هەندێك مێتولکە وەکو هێنی کرمی ئاوریشم بـە دەوری خۆیـدا دەیچێنێـت. هـەتا گەورە و هەراش دەبێت ئەوسا لێی دێتە دەرەوە. |
| صلخ - صمم - كامل - طرش كامل | Deafness = anacusis = anakusis | کەڕیی تەواو. |
| صَلد | Solid = hard = rigid = scirrhous | پتەو، ساخت، زۆر ڕەق. |
| صلد | Scirrho | پێشگرێکە بە مانای (پتەو). |
| صلد - أصلد - صلود | Dysspermic | پیاوێك بە زەحمەت ئاوی بێتەوە |
| صلصال | Argillite | بەردە قوڕ. |
| صلصال حراري | Fire clay | قوڕی ئاگرین، جۆرە قوڕێکە بەرگەی ئاگر دەگرێت. |
| صلصال احمر | Red clay | قوڕە سوور. |
| صلصال - طفل - طين | loam = clay = argil | قوڕ، گڵ، بەردێکی نەرمە دەشێت بە نینۆك بڕووشێنرێت. |
| صلصال طيني | China- clay = kaoline | گڵی چینی، گڵێکی سپیی نەرمی چاکە بۆ دروستکردنی گڵێنە بەکاردێت. |
| صلصل - فاختة - حمامة - مطوقة | Turtle dove, ringdove | کالنجە، جۆرێکە لە کۆتر، تەوقدارە. |
| صلصلة - مرق | Gravy | چێشتی شلە. |
| صلصلة التوابل - صاص - مرق التوابل | Sauce | (سـۆس)، شـلـەیەکی خەسـتە دەکرێتـە شووشـەوە، بریتییـە لـە تێکەڵاویدۆشاوی تەماتە و تـەمرهیند و بـەهارات و کرۆکی میوە و بۆنی خۆش، لەگەڵ خواردەمەنیدا بەکاردێت. |
| صلصلة بيضاء | White sauce | سۆسی سپی، جۆرێکە لە سۆس لە ئارد و شیر و کـەرە... هتـد دروست دەکرێن. |
| صلصلة طماطم بالتوابل | Chill sauce | سۆسی تەماتە بە بەهارات. |
| صلصة الفلفل | Chili- chile | سۆسی گۆشتی کوڵاو بە بیبەر. |
| صلصلة السيوف | Clash of swords | زرنگەی شیر. |
| صلطة - صلاطة | Salad | زەڵاتە، جۆرە خواردەمەنییەکە لە سەوزەی چنراو و ترشی (سرکە یان ئاوی لیمۆ) و خوێ و هەندێك جار بە هارات دروست دەکرێت. |
| صلطة المانجو | Mango salad | ترشیاتی عەمبە، ترشیاتی عەمبەی چنراو کە لە بەهاراتدا خۆش دەکرێت و دەکرێتە شووشە یان پیپی تەختەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| صلع - صلعة - مرط | Baldness = calvities = alopecia | سەرتاسی، قژ ڕووتانەوە، سەر ڕووتانەوە. |
| صلقي - صقـاين - سدا - خلة - نانخواه | Pick tooth = tooth pick | دارسیواك، نانخواز، دەوەنێكی دەشتەكی و كشتوكاڵییە، گوڵەكەی بە شێوەی چەترێكی سپیی بۆنخۆشە، لاسكەكەی بۆ ددان ئاژنین باشە، تۆوەكەی بۆنخۆشە، دەكرێتە نانەوە، هەروەها دەرمانی بەردی گورچیلەی لێدەردەهێنرێت. |
| صلّ - نجا - كوبرا ناشر - ناغران - رحة | Cobra = naja = egyptian asp = viper = adder | كۆبرا، ماری چاویلكەدار، مارێكی زۆر ژەهراویی كوشندەیە، سەری پانە و كلكی كورتە، هەندێكیان هێڵی قاوەیی و زەردیان تیایە، ملی پان و قوپاوە لە كاتی تووڕەبووندا دەناوسێت |
| صلنباج - أنقليس - قريث - نون - شكك - مرمريج - جريث - انكليس | Common eel | مارماسی، ماسییەكی لاكێشەیی پانكەڵەیە. سەری لاكێشەییە، ددانی هەیە، ڕەنگەكەی مەیلەو سەوزە، وەكو مار ژەهری هەیە. |
| صلود (رجل) | Dysspermic | پیاوێك بە زەحمەت ئاوی بێتەوە لە كاتی جووتگرتندا. |
| صلّور - سلور | Cat- fish = silurus | (سلیور) ماسییە پشیلە، ماسییەكی ڕووبارییە لە مار ماسی دەچێت. نێرەكانیان گەرا پیتێنكراوەكان دەخەنە ناو دەمیانەوە هەتا هەڵدێن و دەچنە ناو ئاوەكەوە. |
| صلودة - إحتباس المني - عسر قذف المني | Spermatoschesis = dysspermia | بە زەحمەت ئاو هاتنەوەی پیاو. |
| صلوخ - صملاخ - اف | Cerumen | چڵكی گوێ. |
| صليب | Cross | چوار مێخە، چەقر، چەلیبا، خاچ. |
| صليب جنوبي | Acrux = southern cross | خاچی باشووری، كۆمەڵە ئەستێرەیەكە لە چوار ئەستێرە پێكهاتووە لە شێوەی خاچدا لە نیوە خڕۆكی باشووری زەویدا دەبینرێت. |
| صليب شمالي | Cross | خاچی باكووری، كۆمەڵە ئەستێرەیەكە. |
| صليبي | Cross shaped = crucial = cruciform | خاچی - صەلیبی - شێوە خاچی. |
| صليل - صلصلة | Clash | چكەچك، جرنگە جرنگ، جرنگە جرینگە، خرینگە خرینگ، زڕە زڕ، خرینگ و هوڕ. |
| صليجة - صولجة | Naked silver | زیوی خالیسە، زیوی پاك. |
| صليب البحر - نجم البحر - كوكب البحر | Star fish, asterias | ئەستێرەی دەریا، جۆرە گیاندارێكی نەرمۆڵەیە. |
| صليبيات | Cruci ferae | خاچییەكان، كۆمەڵە ڕووەكێكی دوو لەتكەیین، گوڵەكانیان چوار پەلكن وەكو خاچ وانە، تۆوەكانیان چەورن وەكو كەلەرم و خەرتەلە و توور و تەرەتیزە. |
| صُم بُكم | Deaf- mute | كەڕولاڵ. |
| صُمام | Valve = stopper | زمانە، دەرگاناخن، گوڵبێنە، پشك، دەمەوانە، تۆپەوانە، دەرچە، پاشەوانە، ئەو ئامرازەی كە بۆ دەستبەسەراگرتنی شلەو گاز بەكاردێت و بۆ هەوەی كە تەنها بەیەك ڕێڕەودا بڕۆن. |
| صمام الأمان | Safety valve | زمانەی پارێزگاری، زمانەی دڵنیای |
| صماخ - ممر | Passage = metas | ڕاڕەو، كون، بۆڕی. |
| صماغ | Birdou = perleche | سووتانەوەی لالغاوەی دەم لە منداڵاندا. |
| صماغة - قنينة الصمغ | Gum- pot | شووشەی زەمق، زەمقدان. |

صماغ الاذن — Cavity of ear = meatus = acusticus = auditory canal — بۆڕیی گوێچکە، کونی گوێ، ئەو بۆڕییەیە کە دەرمەوەی گوێچکە بە ناوەوە دەگەیەنێت.

صمام قلبي — Cardiac valve — زمانەی دڵ، دەرچەی دڵ.

صمام الرحم - عنق الرحم — Utero- cervix — زمانەی منداڵدان.

صمام راديو - انبونة — Radio tube electron — زمانەی رادیۆ، بۆڕیی رادیۆ، زمانەی ئەلیکترۆنی، بۆڕیی ئەلیکترۆنی، بریتییە لە بۆرییەکی شووشەیی یان کانزایی لە هەوا بەتاڵکراوە، کاتۆدێکی گەرمکراوی تیادایە کە ئەلیکترۆن یان ئایۆنی لێدەردەپەڕێت، لەگەڵ لەوحێك (ئەنۆدێك) کە ئەلیکترۆنەکان بۆ لای خۆی رادەکێشێت، هەروەها تۆڕێکی تێدایە کە دەرپەڕینی ئەلیکترۆنەکان رێکدەخات، ئەم جۆرە بۆڕییانە لە بازنە رادیۆییەکاندا بەکاردەهێنرێن بۆ مەبەستی گەورەکردنی تەزووی کارەبایی یان دۆزینەوەی نیشانەکانی بڵاوکردنەوەی دەنگ.

صمام مفرغ - صمام التفريغ — Vacuum tube = vacuum valve — زمانەی بەتاڵکراوە، زامنەیەکی ئەلیکترۆنییە هەتا رادەیەك لە هەوا و گاز بە تاڵکراوەتەوە بە شێوەی ئەوتۆ کە کار ناکاتە سەر رەوشتە کارەباییە سەرەکییەکەی.

صمام ثرميوني - صمام آيوني حراري — Thermionic valve = thermionic tube — زمانەی پێرمیونی، زمانەیەکە کار دەکاتە سەر رۆیشتنی تەوژمی کارەبایی بە چەند رێگەیەکی جیاواز.

صمام ثنائي — Diode — زمانەی دووانی، زمانەیەکی پیرمۆنییە دوو ئەلەکترۆدی تیادایە بۆ دۆزینەوەی شەپۆلی رادیۆ بەکاردێت.

صمام ثلاثي — Triode — زمانەی سێیانی، زمانەیەکی پیرمۆنییە سێ ئەلەکترۆدی تیادایە بۆ گەورەکردنی نیشانە (اشارات).

صمام رباعي — Tetrode — زمانەی چواریی، پیرمۆنییە، چوار ئەلەکترۆدی تیادایە.

صمام خماسي — Pentode — زمانی پێنجی، زمانەیەکی پێرمۆنییە، پێنج ئەلیکترۆدی تیادایە، لە دەزگای لاسلکی و تەلەفزیۆندا بەکاردێت.

صمام سداسي — Hexode — زمانەی شەشی.

صمام سباعي — Heptode — زمانەی حەوتی.

صمام تاجي - صمام انيني بطيني — Mitral valve — زمانەی نێوان گوێچکەلە و زگۆڵەی دڵ، زمانەی تاجی، کەوتۆتە بەشی لای چەپی دڵەوە.

صمام صغير — Valvula — زمانەی بچکۆڵەی، زمانۆکە.

صمام تحويل — By- pass valve — زمانەی گۆڕین.

صمام غازي — Gas valve — زمانەی گازی.

صمام التحكم — Control valve — زمانەی دابینکردن.

صمام مروحي - صمام الفراشة — Butterfly valve — زمانەی پانکەیی.

صمام البندقية — پیتکەی تفەنگ، نیسکەی تفەنگ.

صمام بوابي — Gate valve — زمانەی دەرگاوانی، کەوتۆتە نێوان گەدە و ریخۆڵەوە.

صمام كروي — Globe valve — زمانەی گۆیی.

صمام اللاسلكي — Wireless valve — زمانەی لاسلکی.

صمام إبري — Needle valve — زمانەی دەرزیلەیی.

صمام الخناق — Throttle valve — زمانەی خنکێنەر، زمانەیەکە لە مەکینەی ئۆتۆمۆبیلدایە، دبێتە هۆی کەم کردنەوەی خێرایی مەکینە.

| | | |
|---|---|---|
| صمامي | Valvular | زمانەیی، شتێك پێوەندی بە زمانەوە هەبێت |
| صمام أبهري | Aortic valve | زمانەی شاخوێنبەر. |
| صمام حلزوني | Spiral valve | زمانەی مارپێچی، زمانەیەکە لە لەشی ماسی لامپریدا هەیە |
| صمام إنزلاقي | Stide valve | زمانەی خلیسکان. |
| صمام تنفيس - صمام تصريف | Vent valve = relief valve | زمانەی هەناسەدان. |
| صُماغ - تصمغ - مرض الصمغ | Gummosis = gum disease = rocky land | زەمقاویی بوون، نەخۆشی زەمق، نەخۆشییەکە لە قەدو لقی درەختی بەردار دەدات، زەمقیان لەسەر پەیدا دەبێت. |
| صمانة | Rocky land | زەوی بەدەڵانی. |
| صُمات - بكم - خرس | Mutism = aphemia | لاڵی، نەمانی توانایی قسەکردن لە مێشکدا. |
| صماغ - نبات صمغي | Gummiferous plant | ڕووەکی زەمقدار، هەر ڕووەکێك زەمق دەربدات. |
| صماء | Deaf | کەڕ (بۆ مێیینە). |
| صمت - سكوت | Silence | وسکتبوون، دەمکوت، قروقەپ، خپی، کپی، کڕی، بێدەنگی. |
| صمد (اصماد) | Trousseau = brides outfit | جیازیی بووك. |
| صمران | Penaea | (پینایا)، دەوەنێکە لە ناوچە گەرمەکاندا دەڕوێت، شاوکێکی زەمقی لە توێکڵەکەی دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی برین. |
| صمريص | | بروانە (شمذامە) |
| صمغ - سكك | Mocrotia | گوێ بچووکی. |
| صمعاء - اصمع | Microtic | گوێی بچووك. |
| صمعاء | Aotus | (ئۆتەس)، دەوەنێکی دەشتەکیی دڕکاوییە، گەڵاکەی لە کەوچك دەچێت، گوڵەکەی زەردە بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت. |
| صمعة - اصمعي - العشب السيفي | Needle grass = sword grass = spear grass | گیا دەرزیلە، گیاتیر، گیا شمشێر، گیایەکە گەڵاکەی لە شمشێر دەچێت. |
| صمغ | Glue = gum = colla | کەتیرە، جەوی، هەنگوژە، زەمق، گەرجن، مادەیەکی لینجی بێبۆن و تامە لە قەد و لقی درەختەوە دەردەهێنرێت، هەندێك جۆری لە ئاودا دەتوێتەوە، بۆ گەلێك مەبەست بەکاردێت. |
| صمغ التطعيم | Grafting mastic | زەمقی متوربە، ئەو زەمقەی کە لە شوێنی متوربەکردنی درەخت دەردێت. |
| صمغ شجرة الآس | Myrtle-gum | دەنجان، زەمقێکە لە داری مۆرد دەردەهێنرێت. |
| صمغ الأذن | Ear wax = cerumen | چڵکی گوێ، مۆمی گوێ، مادەیەکی زەردە کونی گوێ دەریدەدات، دیمەنێکی چەوری هەیە ئەگەر لە کونی گوێدا زۆر بوو و پاك نەکرایەوە دەبێتە هۆی گوێگرانی. |
| صمغ السذاب - صمغ الفيجن | Ruegum | هەنگوژەی سەدرو، هەنگوژەی (زەمقی) پێچن. |
| صمغ الأدرك | Plum gum | جەویی هەڵووژە. |
| صمغ الكينو | Kino gum | زەمقی کینۆ، زەمقێکی تفتە لە جۆرە درەختێکی سەنەڵ دەردەهێنرێت پێی دەگوترێت سەنەڵی ئەفریقی. |
| صمغ الستايركس - لبان جاوي - بخور جاوي - صمغ البنزين - صمغ جاوي | Styrax- benzoin = gum-benjamin = benzoinum | زەمقی بنیامین، زەمقی بەنزۆمین، جۆرێکە لە زەمقی جاوی، جۆرە ریسێنێکە لە توێکڵی داری جاوی دەردەهێنرێت، بۆنیخۆشە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| صمغ الخروب | Ceratonia | زەمقی خرنووك، تۆزی تۆوی خرنووك. وەكو كەتیرە بەكاردێت. |
| صمـغ الصنوبـر - قلفونيـة - صمغ راتنجي | Colophony = gum- rasin | (رێسین) شەبێنە، جەوی. جۆرە زەمقێكە لە سنەوبەر دەردەهێنرێت، (زەمقی رێسینی) |
| صمغ اللك | Shellac = shell-lac = gum lac | لۆك، زەمقی لۆك. شیلاك. |
| صمغ عربي - صمغ سناري - صمغ الطلح - صرب - صمغ السنط | Arabic gum = chewun = Gum acacia | زەمقی عەرەبی، جەوی، وەفر، باخری، جافری. گەموون. رووەكێكی كێوێلەیە، گوڵەكەی پەمبەییە، جۆرە كەتیرەیەكی لێدەردەهێنرێت لە پیشەسازی خۆراك و پزیشكیدا بەكاردێت. |
| صمغ الكثيراء - كثيراء - اسطرا غالوس - صمغ القتاد | Tragacanth = gum dragon | كەتیرە. دەوەنێكی دڕكاوییە كەتیرەی لێدەردەهێنرێت، كەتیرەی سپی |
| صمغ جاوه = طبرخي - كوتا برشا | Gutta percha | زەمقی جاوە، گەتاپێرچا. جۆرە ڕەمەیەكە لە درەختی تایبەتی دەردەهێنرێت لە وڵاتی مالیزیا. |
| صمغ الذباب - علوك احمر | Catchfly | مێشگرە، زەمقی مێش، زەمقی سوور، گیایەكی پزیشكییە گوڵەكەی سوورە، مادەیەكی لینج دەردەدات، مێرووی پێوە دەنووسێت. |
| صمغ شجر الزيتون | Scorax | سكۆراكس، زەمقی داری زەیتوون. |
| صمغ هندي - صمغ مرن - صعرور | Gum- elastic = indian rubber = caoutchoke | كاوچۆك - لاستیك. |
| صمغ أزرق - شجرة الكافور | Camphor tree | درەختی كافور، درەختی زەمقی شین، جۆرێكە لە یوكالیپتوس. |
| صمغ راتنج القلفونية | Rosin gum | زەمقی رۆسین، مادەیەكی راتنجیی رەقە لە ئەنجامی دڵۆپاندنی رۆنی تەربەنتین لە راتنجی سنەوبەر بەجێ دەمێنێت |
| صمغ سائل = محلول الصمغ | Mucilage | زەمقی شل، كەتیرەی گیراوە. |
| صمغة الريح | | قەسەنی، مادەیەكی لە رووەك دەگیرێت و بە شێوەی دەرمان بەكاردێت. |
| صمغي | Gummy = gummatous | زەمقی، كەتیرەی. |
| صمغان - صمغتان - صامغان | Per leche | لاڵغاو، گۆشەی دەم، شوێنی بەیەكگەیشتنی لچ و لێو. |
| صمغة - لبا - لبن اخضر | Green milk = colostrum | ژەك، یەكەم شیر كە لە مەمكی دایكەوە دوای منداڵبوون دێتە دەرەوە. |
| صمل | Rigidity | رەقیی، سەختی. |
| صمل - أبو الهول | Hawk- moth, beemoth = galleria | مۆرانەی هەنگ، جۆرە پەپوولەیەكی زیانبەخشە، كرمەكەی لەسەر مێوی هەنگوین دەژی. |
| صملاخ - اف - شمع الأذن | Cerumen = ear wax | چڵكی گوێچكە، مێوی گوێ. |
| صمم | Deafness = surdity | كەری. |
| صمم بكم | | كەری و لاڵی. |
| صمولة - صامولة | Nut | سەمووڵە، ئەڵقەیەكی ئاسنە و لە برغوو قایم دەكرێت. |
| صمون | Loaf | سەموون، جۆرێكە لە نان بۆ خواردن. |
| صميم | Bottom | ناخ، كان. |
| صُمَيلة | Prolapse of anus | داكەوتنی كۆم، هاتنە دەرەوەی كۆم. |
| صناعة | Industry | پیشەسازی. |
| صناع - صنايعي | Technician = skilled worker | پیشەساز، وەستای پیشەسازی. |

| | | |
|---|---|---|
| صناعة - حرفة | Profession = trade | پیشه. |
| صناعات زراعية | Agricultural- industries | پیشەسازیی کشتوکاڵی، وەکو پیشەسازیی شەکر و ئەلکحول و سرکە و شەراب و نشاستە و بیرەو ڕۆن و عەتر و.. هتد. |
| صناعي - صاحب المصنع | Industrialist | خاوەن کارگە، پیشەساز. |
| صناعي | Artificial | دەستکرد، پیشەسازییانە. |
| صناعية | Industrialism | پیشەسازێتی، ڕێکخستنی کۆمەڵی میللەت بە شێوەیەکی ئابوورییانە بە ڕێگەی پیشەسازی. |
| صنائع و فنون | Oftrodesand art | پیشەسازاییەکان و هونەرەکان. |
| صناعة ثقيلة | heavy industry | پیشەسازی قورس. |
| صناعة خفيفة | Light industry | پیشەسازی سووك. |
| صناعة الحفر او النقش على الأحجار الكريمة | Glyptography | پیشەسازی نەخش و هەڵکەندن لەسەر بەردی بەنرخ و گەوهەر. |
| صناعة وطنية | National industry | پیشەسازی خۆماڵی. |
| صناعة الألبان - لبانة | Dairying | پیشەسازیی شیرەمەنی وەکو پیشەسازیی ماست و کەرە. |
| صناعة يدوية | Handicraft | پیشەسازیی دەستی، پیشەسازیی دەستکرد. |
| صناعة الخرائط الجغرافية | Cartography | کارتۆگرافی، دروستکردنی نەخشە و پەیکەری جوگرافی. |
| صنارة = شصّ | Uncus = hook = angle | قولاپ، تەبەتە. |
| صنارية - دودة شصية - انكلستوما | Hook worm = ancylostoma | کرمە قولابیی، کرمی ئەنکستۆما، کرمێکی زیانبەخشە لە ڕیخۆڵەی مرۆڤدا دەژی. |
| صناء | Ash = cindres | خۆڵەمێش، مشکی، خۆڵەکەوە. |
| صنار - دلب شرقي - جنار | Oriental plane tree = platan | سوورە چنار، چنار، درەختێکی مەزنە، گەڵاکەی پەلکدارە لە گەلامێو دەچێت، بەرەکەی لاسك شۆڕ و خڕ و تووکنە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە بەکاردێت. |
| صنة - صنان = عرق الأقدام | Podobromidrosis | ئارەقی پێ، ئارەقی ناو پەنجەکانی پێ. |
| صُنان - صنة | Stench = badsmell | بۆنی بنباخەڵ، بۆ درن، بۆنی میز، بۆ کەڵێشە. |
| صناج | Cymbalist | چەقەنەلێدەر. |
| صناجة - ماموث | Mammoth | (ماموث) فیلێکی قڕماتووە. |
| صناء - غضن زغبي - غضن ارزق | Blue-mold, downy mildew | کەڕووەشینە، نەخۆشییەکی ڕووەکییە بە هۆی کەڕووەوە دەبێت لە ڕووەکی سپێناخ و پۆلکە و تووتن و چەوەندەر دەدات. |
| صناب - حرف = رشاد | Cress | تەرەتیزە یان کووزەلە. |
| صنبور - حنفية | Cock = tap | کونی بەلوعە، کونی حەوز، پلووسك. |
| صنيج - صنوج - صحنان | Castanets = symbal | چەقەنە، دوو پارچە لەوحی بازنەیی تەکمە دەکرێتە پەنجەکانی دەستەوە بۆ چەقەنە لێدان. |
| صنجة (في البناء) | Archstone | تاقی بەرد، ئەو تاقەی کە بە بەرد دەکرێت لەسەر دەرگا و پەنجەرە. |
| صنجية | Crotalaria | (کرۆتالاریا)، دەوەنێکە بۆ ڕازاندنەوە، دەنگی تۆوەکانی لە بەرەکاندا لە دەنگی چەقەنە دەچێت. |
| صنجية - افنون | Rattle snake | ماری زەنگۆڵەدار. |

| | | |
|---|---|---|
| صندل | Sandal = santal = santalum = petrocarpus | سەنەڵ، کینو، درەختێکی هیندیی گوڵ سپییە تەختەکەی قایم و بۆنخۆشە و بە نرخە و هەمەڕەنگە، بەرەکەی بە شێوەی هێشووە، دەنکەکەی سەوزە و بۆ مەبەستی پزیشکی بۆ نەخۆشیی دڵ بەکاردەهێنرێت. |
| صندل - ارقية الصنوبر | Phalaena of pine | پەپوولەی سنەوبەر، پەپوولەیەکی زیان بەخشە بە داری سنەوبەر. |
| صنـــدل افريقـــي - صنـــدل قنفـــذي - شجرة صمغ الكينو | African sandal wood = kino gum tree | سەنەڵی ئەفریقی، سەنەڵی ژیشکی، جۆرێکە لە داری سەنەڵ، دەرمانی گیرکردنی لێدەردەهێنرێت پێی دەگوترێت کینۆ. |
| صندل ابيض | White sandal wood | سەنەڵی سپی، تەختەکەی سپییە. |
| صندل ليموني | Yellow sandal wood | سەنڵی، زەرد، تەختەکەی زەردە. |
| صندل اندمان | Andaman wood | سەنەڵی ئەندامان، تەختەکەی سوور و بە نرخە. |
| صندل هندي | India wood | سەنەڵی هیندی، تەختەکەی بە نرخە، گەڵاکەی دەدرێت بە ئاژەڵ. |
| صنـــدل احمـــر - قاطر - دم الأخوين | Red sandal wood tree = dragon gum tree | سەنەڵی سوور، خوێنی دوو براکە، تەختەکەی سوورە ڕەنگی لێ دەردەهێنرێت. |
| صندل - ماشوط | Common magpie moth | مۆرانەی بادەم، کرمی بادەم، جۆرە کرمێکە لە گەڵای درەختی بادەم دەدات. |
| صندل | Barge | کەشتییەکی ڕووبارییە بۆ گواستنەوە. |
| صندل - نهل - صندال | Sandal | سەندەڵ، جۆرە پێڵاوێکی سووکی سەربەرەڵڵایە. |
| صندر | Sandra | (ساندرا)، ماسییەکی ڕووباریی سەوزی مەیلەو قاوەییە. |
| صندوق | Box = case = coffer | سنووق. |
| صندوق الأوساخ | Rabbish = dirty box = dirtiness box = filth box = filthness box | سنووقی پیسایی، تەنەکەی خۆڵ، تەنەکەی زبڵ. |
| صندوق كبير - سحارة | Chest | سنووقی گەورە، یەغان. |
| صندوق تأمين | Insurance fund | سنووقی زامن کردن. |
| صندوق التسليف الزراعي | Agricultural credit-fund | سنووقی پێشەکیی کشتوکاڵی. |
| صندوق التنمية | Development fund | سنووقی پارەی گەشەپێدان. |
| صندوق النقد الدولي | International monetary fund | سنووقی پارەی دەوڵەتان. |
| صندوق مُصوت | sound box | سنووقی دەنگەوەر، دەسکی سنووقی گۆرانی کە دەرزییەکەی پێوە قایم دەکرێت و بەسەر قەوانەکەدا دەخولێتەوە. |
| صندوق الدنيا - صندوق الفرجة | Peep- show = cosmorama | سنووقێکە وێنەی جوان و سەیری تیا پیشان دەدرێت بۆ ڕابواردن. |
| صندوق النقود | Cash box = till | دەغیلە، سنووقی پارە کۆکردنەوە. |
| صندوق عمل القوالب - ريزق | Moulding- box | سنووقی دروستکردنی قاڵب. |
| صندوق المقاومة | Resistance box | سنووقی بەرهەڵستی. |
| صندوق التوفير - بنك التوفير | Savings- bank | بانقی پاشەکەوت. |
| صندوق الميت | Coffin = casket | سنووقی مردوو، تابووت، ئەو سنووقەی کە مردووی تێدەخرێت، دارەمەیت. |
| صندوق الملابس | Trunk | سنووقی جلوبەرگ. |

| | | |
|---|---|---|
| صندوق الثلج | Ice box | سنووقی بەفر، سنووقی بەرف. |
| صندوق الأدوات | Kit = toolbox | سنووقی ئامراز و دەزگا. |
| صندوق الرمل | Sand box | سنووقی لم، درەختێکە بەرەکەی دەتەقێت و تۆوەکەی دوور فڕێ دەدات. |
| صندوق السرعة | Gear box | سنووقی گێڕ، بۆ گۆڕینی خێرایی ئۆتۆمبیل. |
| صندوق التجميد - مجمدة | Freezer | فریزەر، مەکینەی بەستن، بۆ دروستکردنی سەهۆڵ و پاراستنی خواردەمەنی. |
| صنـــدوق لجمـــع الحشرات | Box for collecting insects = insect spreading board | سنووقی کۆکردنەوەی مێروو. |
| صنصال - صنصار - سنسار | Marten | دەلەك، کووژە، گیاندارێکی گۆشتخۆرە لە رێوی دەچێت پێستەکەی قاوەی و بەنرخە. |
| صُنع | Making | دروستکردن. |
| صنع اليد = مصنوع باليد | Hand made | دەستکرد. |
| صنع الأدوات | Tool making | تۆکمەسازی، تۆکمەچێتی. |
| صنعة | Work = wormanship | پیشە، کار. |
| صنعي | Technic = technique technical = synthatic | پیشەسازیانە، دەستکردانە. |
| صنفرة - سفن | Emery = sandpaper | سمارتە، کاغەزی لم، کاغەزی شووشە، جۆرێکی پیسە لە کۆراندەم (ئۆکسیدی ئەلەمنیۆم) بە تێکەڵاوی لەگەڵ ئۆکسیدەکانی ئاسن، رەنگەکەی رەشە بۆ کراندن و سافکردنی کانزاکان بەکاردێت. |
| صنف | Class | پۆل، وەکوو پۆلی گیانەوەر و رووەك. |
| صنف اللبائن | Mammalia | پۆلی گیاندارە شیردەرەکان وەکو مەڕ و بزن. |
| صنف الطيور | Ares = birds | پۆلی گیاندارە باڵندەکان وەکو کۆتر. |
| صنف الزواحف | Reptilia | پۆلی گیاندارە خشۆکەکان وەکو مار. |
| صنف البرمائيات | Amphibia | پۆلی گیاندارە تەڕ و وشکییەکان وەکو بۆق. |
| صنف الأسماك | Pisces | پۆلی گیاندارە ماسییەکان وەکو سوورەماسی. |
| صنف الشقائقيات - صنف الزهريات | Anthozoa | پۆلی گیاندارە گوڵاڵەییەکان وەکو گوڵاڵەی دەریا. |
| صنف الهايدروزوا | Hydrozoa | پۆلی گیاندارە هایدراییەکان وەکو هایدرا. |
| صنف الكوبيات | Scyphozoa | پۆلی فنجانییەکان، کۆمەڵە گیاندارێکی بۆش ڕیخۆڵەیین وەکو سیی دەریا (ماسییە ولوولەیی). |
| صنـــف الفكيـــات - شفوية الأقدام | Chilopoda, centipedes | پۆلی پێ لچییەکان ، پۆلی گیاندارە سەد پێییەکان وەکو هە:ا، پێ. |
| صنق | Stench = stink | بۆنی بۆگەن. |
| صنم | Image = idol | بت. |
| صنم | Stock | ستۆك، پارچە بەردێکی ئاگرینی کانزاییە وەکو خزابێتە بەردێکی گەورەترەوە وایە. |
| صنمة - قصبة الريش | Staff of the feather | قامیشە پەڕ، ئەو بەشەیە لە پەڕی باڵندە کە لە پێستەکەدا چەقیوە. |

| | | |
|---|---|---|
| صنوبر | Pine- tree = pinus | كاژ، كاج، نەوژ، شادرەخت، سنەوبەر، درەختێكی ناوچە فێنك و ساردەكانە و هەمیشە سەوز، لەبەر جوانی و تەختە بە نرخەكەی و بەرەكەی دەروێنرێت، گەڵاكانی وەك دەرزی وایە، نزیكەی ٨٠ جۆری هەیە، مادەی (ڕیسینی) لێدەردەهێنرێت، بەرەكەی قۆچكەیەكی گرنج گرنجە، بۆ گەلێك مەبەست بەكاردێت و هەندێكیان دەخورێت. |
| صنوبر شيلي | Araucaria imbricata = chile pine | سنەوبەر شیلی، (ئەرۆكاریا). |
| صنوبر حلبي | Aleppo pine | سنەوبەری حەڵەبی. |
| صنوبر النمسا | Austrian pine | سنەوبەری نەمسا، درەختێكی گەورەی لق بڵاوە. |
| صنوبر بحري | Clusrer pine | سنەوبەری دەریای. |
| صنوبر كورسيكا | Corsican pine | سنەوبەری كۆرسیكا، تەختەكەی سپییە. |
| صنوبر لباني | Frankincense- pine = loblolly pine | سنەوبەری بخوردی، سنەوبەری بنێشتی. |
| صنوبر لامبرت - صنوبر جبّار | Lamberts pine = giant pine | سنەوبەری لامبەرت، سنەوبەری مەزن. |
| صنوبر اشيب | Gray- leaf pine | سنەوبەری گەڵا خۆڵەمێشی. |
| صنوبر هيملايا - صنوبر عال | Himalayan- pine | سنەوبەری هیمالایا، سنەوبەری بەرز. |
| صنوبر ارزي | Larch pine | سنەوبەری ئورزی. |
| صنوبر جبلي - صنوبر ابيض | Swiss mountain = (mountain) pine | سنەوبەری چیایی، سنەوبەری سویسری، سنەوبەری سپی، سنەوبەری زیوی. |
| صنوبر مظلي | Parasol pine = umbrella pine | سنەوبەری چەتری. |
| صنوبر اصفر | Yellow pine | سنەوبەری زەرد، سنەوبەری تەختە زەرد. |
| صنوبر كادي | Cade pine | سنەوبەری كادی، عەرعەری كادی، شلەیەكی قەترانی ڕەشی لێدەردەهێنرێت بۆ دەرمانی پێست. |
| صنوبر احمر | Red pine | سنەوبەری سوور، تەختەكەی سوورە. |
| صنوبر مثمر - صنوبر إيطالي | Stone pine = Italian pine | كاژی بەردار، سنەوبەری بەردار، جۆرێكە لە درەختی كاژ، تووەكەی دەخورێت یان دەكرێتە خواردەمەنییەوە. |
| صنوبريات | Coniferae = conifers | كاژییەكان، كۆمەڵە درەختێكی دوو لەتكەیی هەمیشە سەوزن مادەی (ڕێسین) یان تیادایە، وەكو سنەوبەر و سەروو. |
| صنوبر اسود = تنوب اسود | Black- spruce = black- pine | سنەوبەری ڕەش، كاژی ڕەش. |
| صنوبر القطران - صنوبر الأرزة | Picea = pitch pine | سنەوبەری قەتران، جۆرە درەختێكە لە كۆمەڵەی سنەوبەر. |
| صنوبري | Piny = pineal | كاژیی، سنەوبەریی، شتێك پێوەندیی بە سنەوبەرەوە هەبێت. |
| صنوبرة = كرز | Pine- cone | بەری درەختی كاژ یا سنەوبەر كە شێوەیەكی قورچەكیی هەیە. |
| صنو | Brother = twin | هاوسال، هەوەل، هاوز. |
| صنوة | | بڕوانە (فسيل). |
| صهاء | Spring | سەرچاوەی ئاو. |

| | | |
|---|---|---|
| صهارة - نخاع شوكي | Spinal cord | مەغزی دڕکاوی، پەتکی دڕکاوی، بەشێکە لە کۆئەندامی دەماریی بەناو بڕبڕەی پشتدا تێپەڕ دەبێت. |
| صهارة - حممة | Magma | (ماگما)، تۆیەڵە بەردی تواوە و گاز لە ژێر زەویدا کە سارد دەبێتەوە، بەردی بورکانیی لێ پەیدا دەبێت. |
| صهب | Fairness | شڵی، قژ زەردی، قژ سووری. |
| صهباء | Colourless wine = wine | شەراب، شەرابی سپی. |
| صهد | Heat | گەرما، گەرمی. |
| صهر | Fusion = smelting | شلکردنەوە، شلەوەکردن، تواندنەوەی مادەیەك بەکاری ئاگر یان کارەبا. |
| صهريج - صاروج | Cistern = water tank = tank | عەماراو، تانکی ئاو، سارنج، هەر قاپێك یان تەنکییەکی گەورە بۆ گواستنەوەی شلە بەکار بهێنرێت. |
| صهريجية - ناقلة البترول - عربة الصهريج - شاحنة البترول | Tanker = tank wagon tank car | تانکەر، کەشتییەك یان ئۆتۆمۆبیلێك تانکیی ئاو یان نەوتی تیا بێت. |
| صهوة الحصان | Horses back | پشتی وڵاخ. |
| صهور | Liquid flux | شلەوەکەر، مادەیەك کە یارمەتیی شلەوەبوونی کانزاکان بدات. |
| صهور - قابل للانصهار | Fusible | شیاو بۆ شلەبوون، شیاوی شلبوونەوە هەر مادەیەك بشێت بۆ شلەوەبوونەوە. |
| صهيل | Whinny = neighing = a neigh | حیلە، حیکە، حیلاندن، حیکاندن، کۆڕاندن، دەنگی ئەسپ. |
| صهير - صهيرة | Fused = melted | تواوە، شلەوەبوو، شلبوونەوە. |
| صهيرة | Roasted bread | شلکێنە، جۆرە نانێکە هەویرەکەی زۆر شلە لە دواییدا دەخرێتە رۆن و دۆشاوەوە. |
| صهيد = شدة الحرّ | Scorching heat | تینی گەرمی. |
| صُوَ | Young bustard | بەچکە چێرگ. |
| صوابة - صؤابة | Nit | ڕشك، گەرای ئەسپێ. |
| صوّان = ظرّ - حجر القدح | Silex = flint = chert = silica | بەردە ئەستێ، بەردە عازەبە، بەردی چەرخ، بەردێکی سلیکییە بریتییە لە سلیکا لە پیشەسازیی پۆرسلیندا بەکاردێت. |
| صوان - خزانة - دولاب الملابس | Wardrobe | دۆڵابی جلوبەرگ، کەنتۆر. |
| صوان الكتب | Book case | دۆڵابی کتێب. |
| صوان الأضبارات - خزانة الأضابير | File cabinet | دۆڵابی فایل و کاغەزی نووسراوە. |
| صوان أبخرة - خزانة غازات - خزانة الغازات السامة | Fume cupboard | دۆڵابی گازەکان، دۆڵابێکە دەرگاکەی شووشەیە هاتوچۆکات، دووکەڵکێشێکی تیادایە بۆ دەرکردنی گازی ژەهر بە تایبەتی لە دیورای تاقیگەکاندا دادەنرێت. |
| صواعد | | بڕوانە (صاعدة). |
| صوارة - آلة تصوير | Camera | کامیرا، ئامرازی وێنەگرتن. |
| صواح | Gypsum | گەچ، قسل. |
| صواح | Pollen grain | هەڵاڵە، هەڵاڵەی گوڵ. |
| صواري عصبية | Nervous- staff | تێلای دەماریی، بریتییە لە ئەندامی هەستکردن لە پێستی ماسیدا بۆ هەستکردن بە تەوژمی ئاو. |
| صوار - قطيع البقر | Drove of cattle | گاگەل، مێگەل، گاران. |

| | | |
|---|---|---|
| صواران | Angles of the mouth | لالغاوە، گۆشەی دەم. |
| صواب | Right | ڕاست، ڕاستی. |
| صواف | Wooler | خوریدار، هەر گیانداریك لەبەر خورییەکەی پەروەردە بکرێت. |
| صوّاف | Wool merchant = wool strapler = draper | خوری فرۆش. |
| صـواي - بـط نـهري - زاي - زاو | Widgeon = baldpate | مراویی ڕووبار، مراویی سەر سپی. |
| صوب - جهة | Direction = quarter = point of the direction | ناوچە، شوێن، بەرەو. |
| صوبنة - تصبن - تصبين | Saponification | سابوونێن، کرداری دروستبوونی سابوون. |
| صوبة - مدفاة | Stove | زۆپا، کەلێك جۆری هەیە بە نەوت یان بە گاز یان بە کارەبا یان بە دار ئیش دەکات. |
| صوبة | Heap of seeds | کۆمەڵی دانەوێڵە، خەرمانی دانەوێڵە. |
| صوبج = شوبك | Rolling- pin | تیرۆکی نان. |
| صُوَة | Echo = resound | دەنگدانەوە، زایەڵە، بێژن. |
| صُوَة - معلم | Signpost = milestone | نیشانەی ڕێ، ئەو نیشانەیەی لەسەرە ڕێ دادەنرێت بۆ شوێن دۆزینەوە. |
| صوة بحرية | Sea signpost | نیشـانەی دەریـا، تـەنێکی کانزاییـە سـەر ئـاو دەکـەوێت ڕێگـە پیشـانی کەشتییەوانەکان دەدات. |
| صوة | Bench mark | نیشانەی پێوانـی بـەرزایی، ئـەو نیشـانەیەی کـە ئـەندازیار دایدەنێـت بـۆ پێوانی بەرزایی شوێن. |
| صوت | Sound = voice = noise = Voix | دەنگ، نقە، نجە، نکە. |
| صوتي | Vocal , phonal | دەنگی، شتێك پێوەندیی بە دەنگەوە هەبێت. |
| صوتي | Phonic = phono = phon | (فۆن)، پێشگرێکە بە مانای (دەنگ) وەکو لە تەلەفۆندا. |
| صوت الصدر | Stridor | خیزەی سنگ. |
| صوت الموسيقى | Musical sound | دەنگی مۆسیقی. |
| صوت جهوري (عال) | A loud sound | دەنگی بەرز، دەنگی زل. |
| صوت حاد (رفيع) | Eminent sound | زیکە، دەنگی تیژ، زیقەی تیژ باریك. |
| صوت اخشن - صوت مبحوح | Hoarse = harsh = husky sound | دەنگی گڕ، دەنگی نووساو. |
| صوت الأنسان أو الحيوان | Voice | دەنگی مرۆڤ و گیاندار. |
| صوت الخضّ - صوت الخفق | Jolting sound | شڵقە، شڵقە شڵق، شڵپە شڵپ، شڵق و هوڕ، دەنگی ژەندنی مەشکە. |
| صوت الفقاعات | To bubble | بڵقە بڵق. |
| صوت البندقية | Pistol- shot sound | تەقە، تەقەی تفەنگ، زرمە. |
| صوت الحمام - هديل | To coo coo | خوێندنی کۆتر. |
| صوت الضرب | | زرم و کوت، تەپ و هوڕ، شڵپ و کوت. |
| صوت البعير | To growl = grumble | مڕاندنی وشتر. |
| صوت الخنزير | Roaring | مقە، مقەمق، مقواندن، زووڕاندن. |
| صوت الأسد - زئير | Rooring = bellowing | نڕاندن، نەڕەی شێر. |
| صوت الذئب | Wailing | لوورە لوور، زوورە زوور. |

| | | |
|---|---|---|
| صوت الكلب - نباح | Barking | وەڕین، وەڕینی سەگ. |
| صوت الثعلب - ضباح | Yelping | لوورەی ڕێوی. |
| صوت القطّ | Mew | میو، میاوان. |
| صوت البطن | Borborygm = gurgling = Noise in the bowels | قوڕە قوڕی سك. |
| صوت الكسر | | قرچە قرچ، قرچ. |
| صوت الحمار = نهيق | Braying | زەڕینی كەر. |
| صوت الدجاجة - قوق | Clucking = cackle | گارەگار، گاراندنی مریشك. |
| صوت الحديد - صوت السيوف | Clash of swords | شرنگ. |
| صوت الرياح | To whizz = blow with a whistling sound | گژەبا، باگژە، گفە، دەنگی بای تووند و قایم. |
| صوت الشوي | | كزە، دەنگی سووتانی گۆشت. |
| صوت البوم = ضبح | Cry of owl | دەنگی كوندەبەبوو. |
| صوت القبج | | دەنگی كەو، قاسپە، قاسپەی كەو، خوێندنی كەو. |
| صوت الحصان - صهيل | Neighing = whinny | حیلكە، حیلاندنی ئەسپ. |
| صوت الطيور - تغريد | Warbling = twitter | چریكە، خوێندنی باڵندە. |
| صوت الأمواج | | دەنگی شەپۆل، چەڵقاندن. |
| صوت الغرف | | چڵپە، چڵپاندن، ئاوخواردنەوەی سەگ و پشیلە. |
| صوت مسموح | Audibly | دەنگێكی بیستراو. |
| صوت واطىء | Softy = under the breath | دەنگێكی نزم. |
| صوت المضغ | To crunch | مڵچە، خرمە، خرمە خرم، خرچە، خرچە خرچ. |
| صوت الغلي | Simmering | گیزە، گیزەگیز، دەنگی كوڵان. |
| صوت القلي | | چزە، چزەچز. |
| صوت القضم | | خرچە، خرچە خرچ. |
| صوت الشرب | | چڵپە، بڵقە، بڵقە بڵق. |
| صوتيات - علم الأصوات - سمعيات | Acoustics = phonology = phonetics = phonics | دەنگییەكان، زانیاریی دەنگ كە باسی پەیدابوون و ڕەتبوونەوەو شكانەوەی دەنگ دەكات، هەروەها باسی كاری لەرینەوەی هەوا بەسەر گوێچكەدا دەكات. |
| صوجان | Stripe disease, spot blotch, take all | نەخۆشییەكی ڕووەكییە بە هۆی كەڕووەوە دەبێت. لە ڕووەكی دەغڵودان دەدات وەكو گەنم و جۆ. پەڵە پەڵە یان دەكات و تۆوەكانیان پووچ دەكات. |
| صوجة - صويا - فول الصويا = بسلي صينية | Soya- bean = soy bean = soja bean | پاقلەی سۆیا، پۆڵكەی چینی، جۆرە ڕووەكێكە دەنگی بەرەكەی لە فاسۆلیا دەچێت، گوڵەكەی بنەوشەیی یان پەمبەیی یان زەردە، لە ئاردی دەنكەكانی نان دروست دەكرێت بۆ ئەوانەی نەخۆشیی شەكرەیان هەیە، بەرەكەی ڕۆنێكی باش بەگرێت و تلپەكەشی بۆ ئالیكی ئاژەڵ باشە. |
| صوديوم - شذام | Sodium | سۆدیۆم، ناتریۆم، كانزایەكە (میتالێكە) ژمارەی ئەتۆمییەكەی ١١ یە و كێشە ئەتۆمییەكەی ٢٣ یە، ڕەنگەكەی سپیی زیوییە و نەرمە بە چەقۆ دەبڕێت و دەبێت لە نەوتدا هەڵبگیرێت، خوێیەكانی لە دروستكردنی سابوون و شوشە و پەیندا بەشدار دەبن، ناوەكەی لە وشەی (سۆدە) وەرگیراوە، نیشانەكەی (Na) یە. |

| | | |
|---|---|---|
| صودا | Soda | سۆدە، خوێی کاربۆناتی سۆدیۆم. |
| صودا الغسيل | Washing soda = Sodium carbonate = sal soda | سۆدەی شتن، سۆدەی جلشتن، کاربۆناتی سۆدیۆم. |
| صودا جيرية | soda lime | سۆدەی قسلاویی، تێکەڵاوێکە لە هایدرۆکسیدی سۆدیۆم و قسڵی زیندوو بۆ هەڵمژینی شێ و گازەکان. |
| صودا الخبز | Baking soda = sodium- bicarbonate | سۆدەی نان (سۆدیۆم) بایکاربۆنەیت، بێکاربۆناتی سۆدیۆم کە دەکرێتە کێك و نانەوە. |
| صودا كاوية | Caustic soda | قلیە، سۆدیۆم هایدرەکساید، سۆدەی داخکەر، بۆ دروستکردنی سابوون بەکاردێت. |
| صوداليت | Sodalite | (سۆدالایت)، کەرەسەیەکی خاوی ڕۆشنی بریسکەدارە بە زۆری بریتییە لە سلیکاتی سۆدیۆم و ئەڵەمنیۆم و کلۆریدی سۆدیۆم لە بەردە قلییەکاندا هەیە. |
| صور = حائش = بستان النخل | Palm grove | باخی دارخورما. |
| صورة | Allo trope | شێوە، وەکو شێوەکانی گۆگرد. |
| صورة = مخطط | -gram | پاشگرێکە بە مانای (وێنە، هێڵکاری). |
| صورة = شكل | Picture = Image = shape = form | وێنە، نیگار، شێوە، دەرخستنی وێنەیەك لەسەررووبەك بە هۆی زەرەبینەوە. |
| صورة = حشرة بالغة | Mature- insect =adult-insect | مێرووی تەواو، مێرووی هەراش. |
| صورة جوّية | Aerial photograph | وێنەیەك لە ئاسمان (فڕۆکەوە) گیرابێت. |
| صورة شمسية = صورة ضوئية | Photograph | وێنەیەك بە ڕووناکیی خۆر گیرابێت. |
| صورة = بسط | Numerator | سەرەی کەرت. |
| صورة طيفية | Spectrogram | وێنەی شەبەنگی. |
| صورة موجبة | Positive Image | وێنەی موجەب. |
| صورة سالبة | Inverted image | وێنەی هەڵگەراوە، وێنەی پێچەوانە. |
| صورة مقلوبة الجانبين | laterally inverted image | وێنەی دوولا هەڵگەراوە. |
| صورة شعاعية او اشعاعية | Radio graph = radiogram = roentgenogram = skiagram = skiagraph | ڕادیۆگراف، وێنەی تیشکی. |
| صورة منكوسة | Inverted image | وێنەی هەڵگەراوە، ئەو وێنەیەی کە سەرەوەی هاوتای خوارەوەی تەنەکەیە و خوارەوەی هاوتای سەرەوەی تەنەکەیە. |
| صورة مقلوبة | laterally inverted image | وێنەی ڕاست و چەپ، ئەو وێنەیەی کە لای ڕاستی هاوتای لای چەپی تەنەکەیە و لای چەپی هاوتای لای ڕاستی تەنەکەیە وەکو ئەو وێنەیەی کە لە ئاوێنەی تەختدا دەردەکەوێت. |
| صورة ميكروسكوبية = صورة دقيقة | Microphotograph | وێنەی میکرۆسکۆپی، وێنەی ورد. |
| صورة المراة (عكسية) | Mirror image | وێنەی ئاوێنە (پێچەوانە). |
| صورة مكبرة | Magnified image | وێنەی گەورەکراو. |
| صورة متحركة | Motion picture | وێنەی جووڵاو، وەکو لە فیلمی سینەمادا. |
| صورة المرئيات | Visible picture | وێنەی بینراوەکان، ئەو وێنانەی کە دەبینرێن. |

| | | |
|---|---|---|
| صورة بصرية | Optical image | وێنەی بینایی. |
| صورة حقيقية | Real Image | وێنەی راستەقینە، ئەو وێنەیەیە کە بەراستی لە ئەنجامی یەکگرتنی تیشکی ڕووناکییەوە پەیدا دەبێت. |
| صورة معتدلة (قائمة) | Erect image | وێنەی قیت. |
| صورة تقديرية - صورة خيالية - صورة وهمية - صورة غير حقيقية | Virtual Image | وێنەی ناراستەقینە، وێنەی ئەندێشەیی، هەر وێنەیەك لە ئەنجامی بەیەکگەیشتنی درێژبوونەوەی تیشکەکانەوە پەیدا بووبێت نەوەك لە ئەنجامی بەیەکگەیشتنی تیشکەکان خۆیان. |
| صورة طبق الأصل | A true copy = facsimile, duplication | وێنەی کتومەت، وێنەی ڕەنووسکراو. |
| صور = بوق - مزمار البم - زمخر | Bassoon bass = clarionet horn = bugle | (کلارنێت)، زوڕنا، شەیپوور. |
| صورة مجهرية | Photo micrograph | وێنەی مایکرۆسکۆپی، وێنەی فۆتۆگرافی، تەنێك کە بە مایکرۆسکۆپ گیرابێت. |
| صوص - كتكوت = قوب | Chick | جوجك، جوجەڵە. |
| صوصــلاء - صــاصل - اشراس - لبن الطير | Orinthogalum = star of bethlehem | ڕووەکی سرێش، جافیلۆك، ڕووەکێکی پیازییە، نێرکەکەی پووچە، گەڵاکەی درێژ و وشکە، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووە سپی یان سەوز یان زەردە. سرێشی لێدەردەهێنرێت. |
| صوطلة = شوندر | Beet | چەوەندەر، چەوەنەر، چەنەوەر. |
| صوغ - صياغة | Moulding | داڕشتن. |
| صوغ - تركيب | Synthesis | پێکهێنان. |
| صوف | Wool | خوری، پەڕن، پەشم، پەزم، کولك، هەری، هری. |
| صوفان - حراق | Tinder = touch = touchwood = spunk | ١-پووشوو، مادەیەکی خاوی وشکە لە پووش دەچێت بۆ ئاگرکردنەوە بەکار دێت.<br>٢-جۆرە قارچکێك یان قەوزەیەکە لەسەر قەدی درەخت دەڕوێت و دەکرێت بە پووشوو. |
| صوفان - حافرية | Ungulina fomentaria | جۆرە قارچکێکە شێوەی لە نالی وڵاخ دەچێت. |
| صوف مغزول | Woolen yarn = worsted | خوریی ڕێسراو، بەن. |
| صوف معدني | Mineral wood | خوریی کانزایی، مادەیەکە لە خوری دەچێت، لە جۆرە قوڕێکی تایبەتی دروست دەکرێت، دژی ئاگر و بەربەستکردنی گەرمیی و دەنگ بڕین بەکاردێت. |
| صوف الزجاج | Glass wool | شووشە خوری، خوریی شووشە ڕیشاڵی شووشە، ناسوتێت و ورد نابێت، دەخرێتە نێوان قاپ و دەفری شووشەوە دژی شکان. |
| صوف صخري | Rock wool | خوریی بەردین، مادەیەکی داپۆکەرە. |
| صوفية | Woollen sheet | پۆپەشمین، جاجم. |
| صوف الفولاذ | Steel wool | خوری پۆڵا، وردە پۆڵا کە بۆ پاککردنەوە و سافکردن بەکاردێت. |
| صوف الفيلسوف - زهور الزنك - ابيض الزنك = اوكسيد الزنك - البوم نيهيل | = nihil album = flowers of zinc | خوری فەیلەسوف، تۆزێکی سپییە لە ئۆکسیدی زینك لە ئەنجامی سوتاندنی زینك لە هەوادا پێکدێت بە شێوەی بۆیەی سپی بەکاردێت. |
| صوفية | ledum | دەوەنێکی ڕازاندنەوەیە، ڕووی خوارەوەی گەڵاکەی مووی پێوەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| صوفي | Woolen = woollen | خوریی. شتێك پێوەندیی بە خوورییەوە هەبێت. |
| صوك | Sperm of the equidae | ئاوی نێری (سپێرمی) چوارپێی وەکو ئاژەڵ و ولاخ. |
| صول - سمك موسى | Sole fish | ماسیی موسا. جۆرە ماسیی پانکەڵەیە. |
| صول (سول) | Sol | سۆل، گیراوەیەکی مل لە شلەیەکدا. |
| صولة - سطوة | Power | هێرش، پەلامار، هەڵمەت. |
| صولة | Sola = bastard plant = | ئەسکینۆمین (گیاچێرك)، گیایەکە گەڵاکە گەڵاکەی ئاوێتە و پەرداره، گوڵەکەی هەمەرەنگە، قەدەکەی لە دروستکردنی کاغەزدا بەکاردێت. |
| صولانين | Solanine | سۆلانین، ماددەیەکی نیمچە قلیەیی ژەهرینە. |
| صولجة السلطة | Verge | گۆچان، داردەست، دارێکە سەرەکەی چەماوەتەوە، پاشاکان دەیگرن بە دەستیانەوە. |
| صولجان | Caduceus = mace = club | داردەست، گۆچان. |
| صولجاني | Calviform = club- shaped | گۆچانیی، شێوە گۆچان. |
| صولجان (لعبة) | Hockey = cricket = pall-mall | یاریی پۆڵۆ. |
| صولجية | leucadendron- argentum | دارزیو، دەوەنێکە گەڵاکەی رەنگ زیوییە، گوڵەکەی لە شێوەی بۆریدایە. |
| صوم - صيام | Fast = nestia = inedia | رۆژوو. |
| صومعة (للتعبد) | Hermitage | شوێنی پەرستن، پەرستگا. |
| صومعة غلال - هري - سايلو | Grain silo | عەماری دەغڵودان، کەنوو، (سایلۆ). |
| صوملة | Solenanthus | گیایەکە قەدەکەی تووکنە، گوڵەکەی لە شێوەی بۆریدایە، لە پێشدا سوورە پاشان مۆر هەڵدەگەرێت. |
| صوملة، يبوسة الجلد، جفاف الجلد | Xeroderma = xerodermia | پێست وشکبوونەوە، وشکبوونەوە، وشکی پێست. |
| صومرة | A charlae | رووەکێکی کەپریی ڕیشاڵییە لە گوێ ئاو دەروێت، گوڵ و بەرو، تۆوەکەی ناشیرینە. |
| صونومتر | Sonometer | (سۆنۆمەتر)، ئامرازێکە بۆ پێوانی هێزی بیستن. |
| صوندة - خرطوم الماء | Hose | سۆندەی ئاو، بۆرییەکی نەرمە لە لاستیك یان نایلۆن بۆ گواستنەوەی ئاو. |
| صوي | Dry | وشك، وشکەوە بوو. |
| صويا (فول الصويا) | | بڕوانە (صوجە). |
| صيانة | Maintenance = protect = keeping | پاراستن، پارێزگاری، ئاگاداریی. |
| صيانة الحياة | Biophylaxis | پاراستنی ژیان. |
| صياغة | | دارشتن، زەرنگەری. |
| صياح - صراخ | To cry = shouting | قیژاندن، هاوارکردن، قریشکە کردن، بانگکردن. |
| صياح الضبع - عشير | Yelping of the hyaena | لوورەی کەمتیار. |
| صيّاح - شاجة - الكاتب الصياح | Screamer | جۆرە باڵندەیەکی قیژەکەرە. |
| صياد | Hunter = huntsman | راوکەر، راوچی، نێچیروان، شکارچی، سەیفان. |
| صياد الذباب | | بڕوانە (صائد الذباب). |
| صياد السمك | Fisher man = fisher | راوکەری ماسی، ئەو کەسەی کە ماسی دەگرێت. |
| صياد الأرق | | بڕوانە (صائد الارق). |

| | | |
|---|---|---|
| صيادة - نبلة | Catapult | دار و لاستيك، كه مندالأن بۆ بالّنده كوشتن به كارى دهمێنن. |
| صيّاد بالصقر | Falconer | بازدار، هەلۆدار، كەسێك بە باز و هەلۆ راو بكات. |
| صيارة - صيرة - صيار | Fold | تەويله، گەوڕ، پشتێر. |
| صيِّب - مُزنة ركامية | Cumulonimbus | هەورێك كه باران يان بەفر يان تەرزە و ڕەشەباى لەگەلّدا بێت. |
| صيت | Fame | ناوبانگ. |
| صيحة - صياح - صرخة - زغقة | A shout | قيژە، قريشكە، هاوار. |
| صيخد | Facula | پەلّەيەكى بريسكەدارە لەسەر ڕووى خۆر. |
| صيخور | Rock | گەڤر، بەردێكى سەخت و گەورە. |
| صيد - تصيد - إصطاد | Hunting | راو، راووشكار، راوكردن، شكار. |
| صيد السمك | Fishing | راوە ماسى. |
| صيد بفخ | Catch in trap = to trap | راو بە تەڵە. |
| صيدلية = علم العقاقير | Pharmacology | دەرمانسازى، دەرمانگەرى، زانيارى دەرمان. |
| صيدلاني - صيدلي | Pharmacist = druggist = dispense | دەرمانساز، ئەجزاچى، دەرمانفرۆش، دەرمان گرەوە. |
| صيدلة | Dispensing | پيشەى دەرمانسازى، دەرمان گرتنەوە. |
| صيدلية | Pharmacy = drugstore | دەرمانخانە، ئەجزاخانە، دەرمانگە. |
| صيد ليلي | Hunting in night | شەوارە: جۆرە راوێكە لە شەوى تاريكدا بە هۆى چراوە نێچير دەگيرێت. |
| صيدح | Owl (male) | نێرەى كوندەبەبوو. |
| صيدن - زنبار | Sarcophaga | (ساركۆفاگا)، مێشى گۆشت، جۆرە مێشێكى چزووداری پێوەدەرە بەسەر گۆشت و پەنير و پيسييەوە دەنيشێتەوە، هەندێكى ڕەنگەكەى شينە. |
| صيداء | Callionymus | ماسييەكى دەريايى بچووكى لاكێشەيى سەرزلە. |
| صيدناني - تامية | Tamia | تاميا، جۆرێكە لە سمۆرە پێستەكەى پێنج هێلّى رەشى تيادايە. |
| صيدناني = نمل سبعي | Ant- lionfly | مێش، شێرە مێرووله، مێشێكى درندەيە مێرووى تر دەخوات. |
| صيرة - حظيرة الأبقار | Cow shed = cow byre | گەوڕ، پشتێر، جێى ئاژەلّ بە تايبەتى گا و مانگا. |
| صيصة | Knitting fork | قولاپى جۆلا، چەتالّى جۆلا، بۆ ڕێكخستنى تان و پۆ. |
| صيصة المخلب - دابرة | Spur = hind clow | چقە، پەنجەى دواوەى قاچى كەلّەشێر. |
| صيغة | Formula | شێوگ، ياسا، لە كيميادا . |
| صيغـة أوليـة - صيغـة وضعية - صيغة بدائية | Empirical- formula | ياساى سەرەتايى، شێوگى سەرەتايى، شێوگێكە پيشانمان دەدات كە ناو و ئەتۆمى هەر يەكە لەو توخمانەى كەلە ئاوێتەيەكدا هەن رادەيان چەندە. |
| صيغة جزيئية | Molecular- formula | فۆرميولاّى گەردىى، شێوگى گەردىى، ياسايەكە پيشانمان دەدات كە ناو و ژمارەى ئەتۆمى هەريەكە لەو توخمانەى كە لە گەردى ئاوێتەيەكدا هەن چەندە. |
| صيغـة كيمياويـة - قـانون كيمياوي | Chemical formula | ياساى كيميايى، شێوەيەكى كيميايى، كۆمەلّە نيشانەيەكە جۆر و ژمارەى ئەو توخمانە پيشان دەدات كە هاوبەشن لە پێكهاتنى گەردىى ئاوێتەيەكى كيميايیدا. |
| صيغة الكترونية | | شێوگى ئەليكترۆنى. |

| | | |
|---|---|---|
| صيغة بنائية - تركيبية | Structural formula | فۆرمیـولای پێکـهاتن، شـێوگی پێکـهاتن، بریتییـه لـه یاسـای کیمیـایی مۆلیکیولێکی ئاوێته که هاوهێزی (تکافؤ) راستەقینەی هەر یەکێك لەو توخمانە نیشان دەدات کـه لـه پێکهاتنی ئاوێتەکـەدا بەشـدارن، هـەروەها چۆنێتی ریزبوونی ئەتۆمەکانی ئەو توخمانە پیشان دەدات که له پێکهاتنی مۆلیکیولێکدا بەشدارن لەگەڵ چۆنێتی بڵاوبوونەوەیان له بۆشاییدا. |
| صيف | Summer | هاوین، هاڤین، تاوسان، یەکێکه له چوار وەرزی ساڵ له ٢١ی حوزەیرانەوە بۆ ٢١ی ئەیلوول، بەرامبەر بە بورجی (قرژاڵ) و (شێر) و (گوڵە گەنم) واتە بەرامبـەر بـە مـانگی پووشـپەڕ و خـەرمانان و گـەلاوێژە لـە مانگـە کوردییەکاندا. |
| صيفي | Summery | هاوینە، هاوینی، تاوسانی. |
| صيق - مُصلّب = قرزبيل | Crossbill | دەنـووك خـاچی، جۆرێکـە لـە چۆلەکـە ڕەنگـی زەرد و قـاوەیی و ڕەش و خۆڵەمێشی و سپی تیادایە. دەنووکی له شێوەی خاچدایە. |
| صيلم | Sclerostoma | دەمرەق، دەموشك، جۆرە کرمێکـی باریکی مشـەخۆرە لـە لەشی وڵاخدا دەژی. |
| صيني | Porcelain = china = china ware | چینی، فەخفووری. |
| صينية - طبق | Tray = salver | تەبەق، سینی، لەنگەری. |
| صينية المنخل | Sieve trayer | سینیی بێژنگ، لەوحێکی پۆڵی کونکونە لە بورجی (کەلووری) دڵۆپاندنی نەوتی سروشتیدا بەکاردێت. |
| صينية خشبية | Wooden tray | سینیی لەدار، یاڵتەیەك. |
| صينية صغيرة | Small tray | تەپسی. |
| صينية نحاسية | Copper tray | بەرکەش، سینی مس. |
| صيهور - درسوار | Dresser | دۆڵابی حاجەت. |
| صهيب - شدة الحرّ | Scorching- heat | تینی گەرما، گەرمایەکی زۆر. |
| صيوان | Big tent | چادرێکی گەورە. |
| صيوان الأذن | External-ear = pinna = auricle | بەشی دەرەوەی گوێ، کرکراگەی گوێ، نەرمایی گوێ، پەرەکەی گوێ. |

| | | |
|---|---|---|
| ضائنة - ولود | Multipara | شفتەژێ، ژنێك زوو زوو منداڵی ببێت. |
| ضائع | Lost = missing | ونبوو، بزربوو. |
| ضائقة مالية | Financial straits | دەستكورتیی دارای. |
| ضابط | Officer | ئەفسەر. |
| ضابطة الثقوب - برغل | Reamer | (ریمەر)، ئامرازێكی نووك تیژە كونی پێ گەورە دەكرێت. |
| ضابطة موازنة | Governor | رێكخەری هاوسەنگی. |
| ضابط الصوت | Sound control | راگری دەنگ. |
| ضائن - يربوع شفاري | Macroscelide- Jerboa | گوڕهەڵكەنە، گوڕهەڵتەكێنە، گیاندارێكی شیردەرە لە مشك دەچێت، لاقی درێژە گوێی زلە، چاوی دەرپۆقیوە، كلكی درێژە. |
| ضاحجة = دلتا النهر | Delta | میاندواو، مەیانی دوو ئاو. |
| ضاحك (ضواحك)، ضرس | Molar = jaw tooth = back tooth = bicuspid tooth = premolar tooth | خڕێ، ددانی خڕێ. |
| ضاحية | Suburbs = environs = outskirts | دەوروبەر. |
| ضارّ - مضر | Harmful = hurtful = ferocious = savage = fierce | زیانبەخش، زیاندار، درندە. |
| ضاري (ضواري) | Feline animal = Beast of prey = carnivorous | درندە، گیانداری راوكەری گۆشتخۆر وەكو شێر و پڵنگ. |
| ضاري | Cribe = piranha | ماسییەكی بچووكی درندەیە. |
| ضارية | Procrustes | جۆرە قالۆنچەیەكی باڵكالانیی سوودبەخشە. |
| ضارب | Beater = striker | لێدەر. |
| ضارب الى الزرقة - مزرق | Bluish = blueish | مەیلەو شین. |
| ضارب الى الخضرة - مخضر | Greenish | مەیلەو سەوز. |
| ضارب الى السمرة - مسمر | Brownish | مەیلەو قاوەی. |
| ضارب (مائل) الى القرنفلي | Pinkish | مەیلەوپەمبەی. |
| ضارب (مائل) الى البياض | Whitish = whitey | مەیلەو سپی باو، سپی واش. |
| ضارب (مائل) الى الحمرة | Reddish | مەیلەو سوور. |
| ضارب (مائل) الى الصفرة | Yellowish | مەیلەو زەرد. |
| ضاغوط - كابوس | Nightmare | شەوە، ئاڵ (كاتێك كە ژن منداڵی دەبێت) مێردەزمە، موتكە. |
| ضاغطة | Compressor | گووشەر، پەستێنەر، وشەر. |
| ضاغطة الغازات | Gas compressor | پەستێنەری گاز، جۆرە ئامرازێكە. |
| ضال - ضال = عناب بري = سدر البر | Lotus tree = wild jujube = zizyphus lotus | عەنەبە كێویلە، سنجوو، جۆرە درەختێكە بەرەكەی لە عەناب دەچێت دەخورێت، ئاوی بەرەكەی بۆ نەخۆشیی سنگ باشە. |
| ضالّ | Great stone = erratic | بەردێكی گەورە، گا بەرد. |
| ضآلة - ضؤولة | Smallness = littleness = chertrivism | كەمی. |
| ضآل العظم | Osteomiosis | ئێسك بچووك بوونەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| طبقة ، مرتبة، منصب | Class, order, rank | پایە، پلە. |
| طبقة سفلي | Substratum | چینی بنەوە، چینی ژێرەوە . |
| طبقة بريتونية | Peritoneal-layer | چینی پریتۆنی ، پەردەیەکی تەنکە بۆشایی سکی لە ناوەوە دەورداوە . |
| طبقة ملونة، طبقة كرية ملونة | Chromosphere | ( کرۆمۆسفیر) ، چینێکی گۆیی ( خڕی) ڕەنگاو ڕەنگە لە بەرگی ڕووناکی خۆردا ( فۆتۆسفیر) لە کاتی خۆرگیرانی تەواودا دەبینرێت . |
| طبقة كنلي هيفيسايد | Kennelly-heaviside layer | چینی ( کنلی هیڤیسایدا) ، چینێکە لە هەوا ، ناوچەیەکە لە گازی ئایۆناویی یان ئەلەکترۆنی سەربەست نزیکەی (٥٠-٩٠) میل لەسەر ڕووی زەوییەوە بەرزە، نیشانەکانی شەپۆلە درێژەکانی لاسلکی ڕەت دەکاتەوە بۆ زەوی لەبەرئەوە یارمەتی بڵاوبوونەوەی دەنگ دەدات بۆ شوێنە دوورەکان . |
| طبقة هنلي | | ( چینی هێنلی) ، چینێکە لە دیواری ( توێکڵی) موو. |
| طبقة هكسلي | Huxley layer | چینی هەکسلی ، چینێکە لە کالانی ڕەگی موو. |
| طبقة الصوت ، درجة النغم | Pitch, tone | چینی دەنگ، پلەی ئاواز . |
| طبق الرماد، طبلة السيكاير | Ash tray | تەپڵەکی جگەرە. |
| طبق رحوي | Rotary disc | تەبەقی دەستاڕیی، تەبەقی خولاوە. |
| طبقة رقيقة | Thin layer, Fine layer | توێژ ، توێژاڵ، توشاڵ، توێخ، توێك . |
| طبق نحاسي | Cupper-dish | تەپسی، تەبەقێك لە مس دروست کرابێت . |
| طبق، ابو طبق، كنف، ابو قرص | Holacanthus | ماسییە تەبەق، ماسییەکی دەریای خڕی قوپاوی ڕەنگینە هێڵی زەرد و پرتەقاڵی و پەمەیی تیایە . |
| طبقي | Stratified | چینیی، هەر شتێك پەیوەندی بە چینەوە هەبێت وەکو چینی بەرد و گڵ و هەور. |
| طبل | Drum | تەپڵ ، دەهۆڵ، کەبرگە، دوومەڵەك. |
| طبلة، دربكة | Darbukka | تەپڵی بچووك. |
| طبلة، منضدة صغيرة | Tablette | تەپڵەك ، مێزێکی بچووك |
| طبلة الأذن، صحناء | Ear Drum, Tympanum, Myringa, Tympanic, membrane | پەردەی گوێ ، تەپڵی گوێ. |
| طبلي | Tympanic, Tympanal | پەردەیی ، هەر شتێك پەیوەندی بە پەردەوە هەبێت |
| طبلة الفوتوغراف، سماعة الحاكي | Sound box | سنوقی دەنگ، بیستۆکی سنوقی گۆرانی. |
| طبلية الأكل | Low round table | تەپڵەی نان خواردن . |
| طبن ، طنبور | Guitar, Harp | تەمورە یان عوود. |
| طُبن | Food of Carrion | ئەو لاشە بۆگەنەی کە دەکرێت بە چەش بۆ ڕاوکردنی سیسارك. |
| طينة، خبزة يابسة، انيطة | Ship-biscuit | نانی ووشك. |
| طبنجة، سلاح ناري، مسدس | Pistol | دەمانچە. |
| طبنجة بمشط | Automatic-pistol | دەمانچەی ئوتۆماتیکی، ڕەشاش. |
| طبوع، قمل العانة، قمامة، عل | Crab-louse | چنکە، چنگنە، ئەسپێی بەر. جۆرە ئەسپێیەکە لە تووکی بەر و بنباخەڵ و برۆدا دەژی. |
| طبونة، طابونة، مخبز | Bakery | نانەواخانە. |
| طبي، حلمة الضرع | Teat, Nipple, Dug | گۆی مەمك، سەری گوان لە گیاندارە سەدارەکاندا. |
| طبي الكلبة، خلاق | | ( بڕوانە سوجر). |

| | | |
|---|---|---|
| طبي | Medical | پزیشکیی، شتێك پەیوەندی بە پزیشکەوە هەبێت. |
| طبيب، حكيم | Medical-doctor, Physician | دوکتۆر ، پزیشك. |
| طبيبة | Lady Doctor, Doctress | دوکتۆر ( ئافرەت). |
| طبيب الإنسان | Dentist, Dental-surgeon, Odontologist | پزیشکی ددان، دوکتۆری ددان، دانساز. |
| طبيب الأطفال | Pediatrician, Pediatrist | پزیشکی منداڵان، دوکتۆری منداڵان. |
| طبيب نفساني | Psychiatrist, Psyehiater | پزیشکی دەروون، دوکتۆری دەروون. |
| طبيب الأنف | Rhinologist | پزیشکی لووت، دوکتۆری لووت. |
| طبيب العيون | Eyespecialist, ophthalmologist, Oculist | پزیشکی چاو، دوکتوری چاو. |
| طبيب بيطري | Veterinary doctor, Veterinary surgeon, Veterinarian | پزیشکی ئاژەڵ ، دوکتۆری ئاژەڵ، بەیتاڵ. |
| طبيب الآذان | Eardoctor, Aurist, Otologist | پزیشکی گوێ، دوکتۆری گوێ. |
| طبيب الأمراض الجلدية | Dermatologist | پزیشکی پێست، دوکتۆری پێست . |
| طبيب الأمراض العصبية | Neurologist | پزیشکی نەخۆشییە دەمارییەکان . |
| طبيب التخدير | Anesthetist | پزیشکی بێهۆشکردن. |
| طبيب دجال | Medicaster, Medicine man, Mounte bank | پزیشکی ساختەچی، کەسێك بە ساختە خۆی کردبێت بە دوکتۆر. |
| طبيب الكلى | Nephrologist | پزیشکی گورچیلە. |
| طبيب القلب | Cardiologist | پزیشکی دڵ. |
| طبيب مولد | Obstetician | دوکتۆری منداڵ پێهێنان، ئەو دوکتۆرەی کە منداڵ بە دایکی دەهێنێت. |
| طبيب الامراض العقلية | Psychiatrist, mad doctor, Alienist | پزیشکی نەخۆشییە زیرییەکان، پزیشکی شێتەکان. |
| طبيلب الامراض النسائية | Gynecologist | پزیشکی نەخۆشی ژنان. |
| طبيب شرعي | Legal medical doctor | پزیشکی شەرعی . |
| طبيب الأشعة | Roentgenologist | پزیشکی تیشك. |
| طبيب جراح | Surgeon, Chirurgeon | پزیشکی نەشتەرگەر، نەشتەرساز . |
| طبيب الشيخوخة | Geriatrician | پزیشکی پیری. |
| طبيب مقيم | House-physician | پزیشکی نیشتەجێ. |
| طبيحا، جوسيا | Primrose-willow | بییە بەهارە، گیایەکی ڕیشاڵداری قەد تووکنە گوڵەکەی گەورەیە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە دەروێنرێت . |
| طبيخ | Cooked food , Decotion | کوڵاو، چێشت . |
| طبيعة | Nature | سروشت، ڕەوشت، خوو. |
| طبيعة مزدوجة | Dual character | جووت سروشتی . |
| طبيعي | Natural-physical, Native | سروشتی، خۆرسکی . |
| طبيعيات، علم الطبيعيات | Physics | زانستە سروشتییەکان ، فیزیا . |
| طبيق | Coronule | تاجۆکە، جۆرێکە لە گوێچکەماسی لەپکەکەی شەش لایە . |
| طثرج، نملة | Ant | مێروولە. |

| | | |
|---|---|---|
| طجن، قلي | To fry | سووركردنەوە بە ڕۆن . |
| طحان | Miller | ئاشەوان، ئاسیاوان، ئاشەڤان، فەراش . |
| طحانة | | ئاشەوانی ، پیشەی گەنم هاڕین . |
| طُحار | | بڕوانە ( زحار) . |
| طحاف، طخاف، طخاء | Cirrus | هەورێکی بەرزی شاشە . |
| طحال | Spleen, Milt, Lien | سپڵ، فاتەڕەشە، خاڵخاڵ ، لوویەکی ئیسفەنجی‌یە ڕەنگی ئەرخەوانی هەیە کەوتۆتە پشت گەدەوە لە لای چەپی لەشەوە فەرمانەکانی لەناوبردنی خرۆکە سوورە پەککەوتووەکانە و دروستکردنی خرۆکەی تازە لە کاتی پێویستدا هەروەها دروستکردنی خرۆکە سپی‌یە لیمفاوی‌یەکان. |
| طُحال، التهاب الطحال | Splenitis | نەخۆشی سپڵ، سووتانەوەی سپڵ . |
| طحالي | Splenic, Lienal | سپڵی ، شتێك پەیوەندی بە سپڵەوە هەبێت. |
| طحان | Miller | ئاشەوان، خاوەن کارگەی ئاش . |
| طحرية ، طحرور | Cloud | پەڵەهەور . |
| طحرة | Tegument | ئەو توێکڵە تەنکەی کە بەر یان تۆوی داپۆشیوە . |
| طحلب (طحالب)، عدس الماء | Moss, Alga, Algae | چووزەوارە ، کەڤس، لیم ، کەوژ، کەڤز، قەوزە، خوریە چنە، گاوا، جلەشڕە، جۆرە ڕووەکێکی سەرەتایی‌یە ، ڕەنگەکەی زۆر سەوزە قەد و گەڵای هەیە ڕەگی ڕاستەقینەی نی‌یە شوێنێکی زۆر لە ناوچە شێدارەکان داگیر دەکات هەندێ جار بە قەدی درەختیشەوە هەیە و چەند ڕەنگێکی تریشی هەیە . |
| طحلب بطي، عدس الماء | Duck weed | چووزەوارەی مروای ، جۆرە قەوزەیەکە سەرئاو دەکەوێت . |
| طحلب اخضر | Chlonophyta, Green alga | چووزەوارەی سەوز . |
| طحلب أحمر | Rhodophyta, Red alga | چووزەوارەی سوور . |
| طحلب بني، طحلب اسمر | Phaeophyta, Brownalga | چووزەوارەی قاوەیی، قەوزەیەکی دەریایی گەورەیە مادەی ئەڵجینی لێدەردەهێنرێت . |
| طحلب اخضر ازرق | Cyanophyta, Blue-green alga | چووزەوارەی سەوزی مەیلە و شین . |
| طحلب اصفر | Chrysophyta | چووزەوارەی زەرد . |
| طحلب ذهبي | Ochromonas, Golden alga | چووزەوارەی زێڕین . |
| طحلب السمك، حزاز السمك | Fish moss | چووزەوارەی ماسی، کەڤزی ماسی ، جۆرە نەخۆشی‌یەکە تووشی ئەو ماسییانە دەبێت کە دەخرێنە ئاوی پیسەوە . |
| طحلب مشطور، دياتوم | Diatom | ( دیاتوم)، چووزەوارەیەکی تاك خانەیە بە میکرۆسکۆب دەبینرێت دیوارەکەی پڕە لە سیلکا . |
| طحلبيات | Bryophyta, Bryophtes | چووزەوارەییەکان ، ڕووەکەکانی کۆمەڵەی چووزەوارە. |
| طحماء | | بڕوانە ( شوکران). |
| طحن | Grinding, Milling, crushing | هاڕین، پەڵخورد. |
| طحين ، دقيق | Meal, Flour | ئارد، وەکو ئاردی گەنم . |
| طحين القمح المشوي | | قاووت، ئاردی قەرەخرمان . |
| طحيل ، حمى فحمية، جمرة خبيثة، حمى الطحال | Anthrax Splenic-fever, Charbon fever | لەرزك، نەخۆشی‌یەکی درمە تووش ئاژەڵ و مرۆڤی دەبێت ، گیاندارەکە هەناسەی خێرا دەبێت و قاچی شل دەبێت و ئەکەوێت و خوێنێکی ڕەش لە لووت و کۆمی‌یەوە دێتە دەرەوە . |

| | | |
|---|---|---|
| طخلء، طخرور | | بږوانه ( طحاف) |
| طخم ، طقم | Set | ( سێت)، تاقم، کۆمەڵێکی تەواو لە شتومەك بۆ مەبەستێکی تایبەتی بەکاردێت وەکو تاقمی تەراش . |
| طخماغ، طخماق، مطرقة خشبية | Wooden-hammer | چەکوشێك لە دار یان لە ئاسن دروست کرابێت بۆ تەختکردنی زەوی . |
| طخمة | Flock of goats | ڕەوەبزن، بزن گەل. |
| طخميل | Cock | کەڵەشێر، کەڵەباب. |
| طراوة، ليونة | Softness, Tenderness | تەڕەیی، ئاوداریی، نەرمی، نیانی . |
| طراوة ، بلل، رطوبة | Moisture | خوناکەو، شێ. |
| طراد، سفينة مطاردة | Chaser-ship, Cruiser | کەشتی ڕاوکەر، کەشتی شەڕ، کەشتی جەنگ. |
| طُرامة | Dry saliva, Dry spittle | لیکی وشکەوەبوو. |
| طراب | Volcanic stone | بەردی گڕکانی . |
| طراحة، فراشة | Mattress | دۆشەك . |
| طرابلس | Dio-spyros-lotus | تەرابلوس، جۆرێکە لە درەختی کاکی، بەرەکەی تفتە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە دەڕوێنرێت . |
| طراخور، اسقمري | Scomber, Mackerel | ( سکۆمبەر)، جۆرە ماسی‌یەکی ئێسکدارە پەرەکەکەی دڕکاوی‌یە . |
| طراز، طرز، نمط، نسق | Style, Type, Fashion | شیوە، تەرز، مۆدێل. |
| طراز جيني جنسي، طراز عرقي | Genotype | ( جینۆتایپ)، تەرزی ڕەگەزیی، پێکهاتنی زگماکی کەسێك یا کۆمەڵێك لە کەسان کە لە پێکهاتنێکی زگماکی تایبەتیدا هاوبەش بن . |
| طراز جلف، مقياس المغناطيسية | Gulf type, Magnetometer | ( ماگنیتومەتر)، ئەزگایەکە بۆ پێوانی موگناتیسی لە فڕۆکەدا بەکاردێت بۆ پێوانی ئەو گۆڕانانەی کە لە کایەی موگناتیسی‌دا ڕوودەدەن . |
| طراز اول، نموذج بدائي | Prototype | شێوەی سەرەتایی ، شێوەی بنچینەیی، شێوەی بنچینەی ڕەچەڵەکی زیندەوەرێك ، بۆ نموونە بنچینەی ئەسەنگ گیانەورێکی چوار پەل بوو . |
| طرب، فرح | Delight, Pleasure | بەزم، ڕەزم، بەزموڕەزم، خۆش . |
| طُرب، ترب، خُث | Peat | خولێکی ئەندامی‌یە ئەشێت بۆ سووتان ، بریتی‌یە لە پاشماوەی ڕووەك . |
| طربوش | Fez, Red cap, Turboosh | فێست، تەپلە، فینۆ، فینۆفیست. |
| طربوش الغراب، لبلاب الحقول | Corn bind, Cornlily, Bear-bine, Bind weed | لاولاو، لاولاوی کێڵگە . |
| طربال، بناية عالية | High building | بینایەکی بەرز، ساختمان . |
| طربال ، معلم | Land mark | نیشانەی سەرەڕێ. |
| طربون | Tender branch, Soft shoot | توڵی تەڕ، شووڵی تەڕ . |
| طربون | Tarpon | تارپۆن، جۆرە ماسی‌یەکە . |
| طربيل، نورج | Threshing-machine | مەکینەی گێرە. |
| طرة | Edge, Margin | قەراغ ، لێوار . |
| طُرَة، قنزعة | Crest, Tufted | پەڕی ( کلاوی) سەری باڵندە. |
| طُرَة، جبين | Forhead | تەوێڵ ، ناوچەوان . |
| طُرَة، طغراء | Monogram | مۆر، دامغە، مۆرێك کەناوی یەکێکی لەسەر هەڵکەنرابێت . |

| | | |
|---|---|---|
| طرَة لم ياط | Head or tail, Match | شێروخەت، جۆرە یارییەکە بە پارەی کانزایی دەکرێت . |
| طرة اللعب، فحاريق، طرة و كتبة | Knotted-hand chief | هەڵمەقۆ، قەمچێن، جۆرە یارییەکە کە هەندێ وورده یان پاره لەبەری لەپدا هەڵدەدرێ و بە پشتی دەست دەگیرێتەوە ، دیسانەوە بە بەری لەپ دەگیرێتەوە تا چەن جارێ بەم جۆرە . |
| طرثوث، زب الارض، أير الذئب | Maltese-Mushroom, Sweet-scented-broomrape, Phelipaea | کێری زەوی ، کێری گورگ، رووەکێکی مشەخۆری بۆن خۆشە لە قارچك دەچێت دەخورێت و سوودی پزیشکی هەیە وەکو بۆ خوێن وەستاندنەوە . |
| طرث ، طرف البظر | Glans clitoridis | سەری قیتکە . |
| طرح ( حساب) | Subtraction | لێدەرکردن لە ژمێرەدا. |
| طرح، إلقاء | Throwing | فرێدان، دەرهاویشتن . |
| طرح، حذف | Deduction | لابردن |
| طرح، خيار ترعوزي | Gerkin, Snake-cucumber | ترۆزی ، چەمیلە . |
| طرح ، سقط | Abortion | لەبارچوو، منداڵی لەبارچوو. |
| طرح الشعر او الريش | Moult | تووك فرێدان ، پەرفرێدان . |
| طرح الجنين، اجهاض | Miscarriage | لەبارچوونی منداڵ، بە راویتەبوون ( لە ئاژەڵدا) . |
| طرحة ، غطاء الراس | Veil, Headveil | سەرپۆش، لەچك. |
| طرخشقون، هندب، طرخشقون، هندباء برية، هندباء مرة | Dandelion, Wild indive, Wild chicory Taraxacum | تاڵیشك، جۆرە رووەکێکە گوڵەکەی ئاڵوزە و بەرەکەی چەترێکی پێوەیە، رەگەکەی بۆ بەهێزکردن و میزکردن بەکاردێت گەڵاکەی تاڵە دەدرێت بە کەو بۆ خواردن . |
| طرخون | Tarragon, Estragon | تەرخوون، ریشاڵۆك، رووەکێکە گەڵاکەی باریك و بۆن و تامی خۆشە دەکرێت بە بەهارات و هەروەها دەکرێتە زەڵاتەوە، دەرمانی بەهێزکردنی پیاوەتی و گەدەی لێدەردەهێنرێت . |
| طردي ، مطرد | Direct | راستەوانە، راستەوخۆ . |
| طرد | Expulsion, Driving-away | دەرکردن، فت کردن، راندن، تاراندن . |
| طرد، فرق النحل | Swarm | پوورەی هەنگ، شارەهەنگ. |
| طرد، رزمة | Parcel, Package | بوخچە، بەستەك. |
| طرد مركزي ، نبذ | Centrifugation | دەرپەراندنی چەقی ، دەرکردنی چەقی ، هێزی پاڵپیوەنانی چەقی بۆ جیاکردنەوەی ئەو مادانە بەکاردەهێنرێت کە لەگەڵ شلەدا تێکەڵاون وەکو بۆ جیاکردنەوەی کەرە لە ماستاو . |
| طر ، زغب | Down | گەندەموو. |
| طرز، طراز، نمط، نسق | | بڕوانە ( طراز). |
| طرزان | Tarzan | ( تەرەزان) ، زەلامێکی ئازای درێژی بەهێزی سوکەڵە. |
| طرس، صفيحة | Paper, Page | کاغەز، پەرە، لاپەرە. |
| طرستوج، سلطان، ابراهيم، فرفورة، بربوني | Red-mullet | موڵێتە سوورە، ( بەربونیی)، جۆرە ماسییەکی بچووکی رەنگینە . |
| طرسوح، بطريق | Penguin | ( پەنگوین)، باڵندەیەکی دەریایی گەورەی لەش سپییە باڵ رەشە لەپکە و ماسی دەخوات، لە ناوچە پۆلییەکاندا دەژی ناتوانێت زۆر بفرێت . |

| | | |
|---|---|---|
| طرشي، مخللات | Pickles | ترشيات . |
| طرش شلغم | Pickles of turip | ترشياتی شێلم، شێلم به ترش. |
| طرشانة، مشمش | Apricots | قەیسی ، مژمژه، زەردەلوو. |
| طرش و خرس | Deaf-mutism | كەڕو لاڵی. |
| طرش ، صمم | Deafness | كەڕیی، گوێگرانی. |
| طرطر، قنطريون صغير، مرارة الحنش | Earth-gall, Fever-wort | گیای تاڵی زەوی ، تاڵەمارانە، گیایەكی پزیشكی‌یە لە زەوی بەیاردا دەڕوێت ، گوڵەكەی پەمەیی‌یە بۆ چارەكردنی تا و كرمی ریخۆڵە بەكاردێت . |
| طرطر، يسروع | Caterpillar | كرمۆكە ، كرمۆكەی مێروو. |
| طُرطُور | Long and lean (man) | زەلامێكی درێژی باریك . |
| طرطور ، طرطور المعطف | Hood, Conical or high pointed cap, | قۆچكە ، شەبقەیەكی درێژی قوچەكی . |
| طرطب | Mastauxe, Big mamma, Pendulous-breast | مەمكێكی زلی شۆڕ |
| طرطوفة، الماذة، تفاح الارض، قلقاس رومي، عباد الشمس العسقولي | Jerusalem-artichocke, Globe-artichok, Canada potato, Tuberous-helianthus | سێوی بن ئەرز، سێفك، ڕووەكێكە سەلكەكەی شیرینە لە پەتاتە دەچێت دەكرێتە ترشیاتەوە هەروەها بۆ نەخۆشی رۆماتیزمە و ئاوسانی جومگە باشە . |
| طرط، سقوط شعر الحواجب | Milphae, Milphosis | ڕووتانەوەی برۆ، وەرینی برۆ . |
| طرطور الباشا، ابو خنجر، جوكلانة كبيرة | Garden-nasturium, Indian cress | كلاوزێڕ، ڕووەكێكە گەڵاكەی لە زێڕ و گوڵەكەی لە كلاوی ئاسن ( خودە) دەچێت . |
| طرطور ، برازية، شجرة البراز | Stinking-bentrefoil, Sterculia | درەختی بۆنگوو، درەختێكی دەشتەكی‌یە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە بەكاردێت، بۆنەكەی ناخۆشە لە بۆنی گوو دەچێت . |
| طرطرات البوتاسيوم الحامضية | Potassiumacid-tartrate | تارتاراتی پۆتاسیۆمی ترش ، خوێیەكە بە شێوەی بلووری یان تۆزی سپی لە دروستكردنی خواردەمەنی و بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت . |
| طرطرت خام، تارتارات خام، حجر النبيذ، جلة | Argol | بەردەمەی ، نیشتوویەكی بلووری مەیلەو خۆڵەمێشی‌یە بریتی‌یە لە خوێی تارتارات لە بنی بەرمیلی شەرابدا پەیدا دەبێت . |
| طرطرات ، طرطير ، ملح الطرطر، طرطرات ، صامور | Tartarate, Tartar | خوێی ترشی تارتاریك . |
| طرطرة | Tartaration | تارتاركردن ، ( تارتارێن) ، سازاندنی شەراب ( مەی) بە ترشی تارتاریك بۆ ئەوەی زیاتر ترش بێت . |
| طرطير الاسنان، قلح، دردي، طلم | Tartar of teath | پەنیرە، بەردی ددان مادەیەكی زەرد یان ڕەشە لەسەر ددان پەیدا دەبێت . |
| طرطير مقيء، دردي مقيء | Tartaremitic | تارتارانی رشێنەوە، خوێیەكی ژەهرینە لە مەیانی پزیشكی و بۆیەكردندا بەكاردێت بریتی‌یە لە تارتاراتی پۆتاسیۆمی ئەنتیمۆن . |
| طرطرات الصوديوم، البوتاسيوم، طرطرات البوتاسيوم، الصوديوم، ملح روشيل | Sodiumpotassium Tartarate, Potassium sodium-tartarate , Rochelle salt | ( تارتاراتی سۆدیۆم پۆتاسیۆم) ، خوێی رۆشیل، مادەیەكی بلووری بێ ڕەنگە یان تۆزێكی سپی‌یە دەكرێتە سۆدەی نان و بۆ مەبەستی پزیشكی و لەناسەرەوەی فەهلینكدا بەكاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| طرطشة، طرششة | Roughcast, Capotement | سواغدانی دیوار، گەچکاریی. |
| طرغلوديتس | Troglodyte | ( ترۆگلۆدیت)، باڵندەیەکی بچووکە لە کۆمەڵەی چۆلەکەیە. |
| طرغون | Trogon | ( ترۆگۆن)، باڵندەیەکی مێرووخۆرە بەسەر درەختدا هەڵدەگەڕێت ، کلکی پانە، پەڕەکەی بریسکەدارە. |
| طرف | Tip, pointed end | پەل، سەر، لا، تەنیشت، چمک، ڕەخ، جەمسەر. |
| طرف ، أصيل | Thoroug bred | ڕەسەن، هەر گیاندارێك باوکە و دایکەکەی ڕەسەن بێت وەکو ئەسپی ڕەسەن. |
| طرف، حد | Extremity, Edge, border | ڕادە، ڕێژە. |
| طرف، نهاية | Acro- | پێشگرێکە بە مانای ( جەمسەر ، کۆتایی ، پەل) . |
| طرف، منتهي | Terminus , Extremity, utmost limit | ئەوپەڕی. |
| طرف مدبب، طرف مستدق | Cusp | نووکێکی باریك. |
| طرف سن | Point, Tip | نووك. |
| طرف ، فريق | Party | کۆمەڵ، تیپ. |
| طرف ، شريك | Part | لا، هاوبەش |
| طرف، ناحية، جهة | Side | تەنیشت، ناوچە. |
| طرف ، عضو | Limb, Acra | پەل. |
| طرف | Member | لا، ئەندام. |
| طرفة، طريفة | Witty saying | نوکتە، قسەی خۆش . |
| طرفاء، أثل، عبل | Tamarisk, Tamarix | دارگەز، دار و دەوەنێکە لە سنەوبەر دەچێت بۆ ڕازاندنەوە بەکاردێت ، لقەکەی باریکە، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی شێوە پەڕی ئەرخەوانییە نزیکەی (٢٠) جۆری هەیە . |
| طرفاء هندية | Indian tamarisk | دارگەزی هیندی ، جۆرە دارگەزێکە مازوویەك دەگرێت لە بۆیە و ڕێنەگرتن دا بەکاردێت . |
| طرفاء نيلية | Nile tamarisk | دارگەزی نیلی، جۆرە گەزۆیەك دەردەدات وەکو شەکر دەخورێت لە ناوچەی سینا دەڕوێت . |
| طرفاء شرقية، أثل الملح | Atlee, tamarisk salt-tree | دارگەزی خوێ، جۆرێکە لە دارگەز بەشێك لە لەشی بە خوێ داپۆشراوە ، لە دوورگەکانی هیندی خۆرهەڵاتدا دەڕوێت. |
| طرفاوية | Myricaria | دارگەزۆکە، دارگەزیلە، جۆرە دەوەنێکە لە دارگەز دەچێت . |
| طرفة العين، طرفان العين | To blink, Wink | چاوترووکاندن ، ترووکەی چاو، بە تیلایی چاو. |
| طرف إصطناعي | Artificial limb | پەلی دەستکرد. |
| طرفس وهمي، طرف كاذب | Pseudopod | گەندە پەل، پەلە درۆزنە ، وەکو لە گیانداری ئەمیبادا هەیە . |
| طرف أمامي | Fore limb | پەلی پێشەوە ، پێشوو، دەست . |
| طرف خلفي | Hind limb | پەلی دواوە ، پاشوو، قاچ. |
| طرف، عين | Eye | چاو. |
| طرف المعادلة | Side of equation | لای هاوکێشە . |
| طرق | Knocking, Beating | لێدان، پیاکێشان. |
| طرقة، خبطة | Knock | لێدان ، پیاکێشان . |

| | | |
|---|---|---|
| طرق بخاري | Steam hammering | پیاکێشانی هەڵمی، پیاکێشان بە شتێکدا بە هێزی چەکوشێکەوە کە بە هەڵم ئیش بکات . |
| طرق المواصلات | Means of communicatons | ڕێگاوبان. |
| طرليوس | Globe flower, Troilius | گوڵە گلۆپ، گیایەکە گوڵی خڕ دەگرێت لە گلۆپ دەچێت . |
| طرم، طريم | Honey-comb | شانەی هەنگ. |
| طرمة، طرمة | Pit of lip | چاڵی لێو. |
| طرمجان، ترمجان | Ptarmigan | ( تارمیجان) ، باڵند··ەکە لە پۆڕ دەچێت ، لە چیای ناوچە ساردەکاندا دەژی ، ڕەنگەکەی ..ومیی پنکەپنکەیە لە هاویندا ، بەڵام لە زستاندا سپی دەبێت. |
| طرمذة، تنجح | Big talk, Brag, Flaunt | قسەی زل، خۆهەڵتراندن . |
| طرماذ، متبجح | Boaster, Braggart | قسەزل، خۆهەڵترێن . |
| طرموس ، خروف سمين | Fatty sheep, Fatling sheep | مەڕی قەڵەو. |
| طرموق ، خفاش | Bat, Vespertilio | شەمشەمەکوێرە . |
| طرمنالية، هليلج | Terminalia | ( تەرمنایا)، هەلیلە، درەختێکە لە زەیتون دەچێت لە ناوچە گەرمەکاندا دەڕوێت ، دەرمانی لێدەردەهێنرێت . |
| طرمبة، مضخة، طلمبة | Pumpa | ترومپا، ئامرازێکە بۆ دەرهێنانی ئاو . |
| طرنة، بطباط، جنجر | Centinode, Kontgrass, Armstrong, Knotweed | گیایەکی دەشتەکی پزیشکییە گەڵاکەی ووردەبەر و تۆوەکەی قوچەکییە چۆلەکە دەیخوات . |
| طرنج، كباد، اترج، تفاح ماهي، اترنج | Citron, Citrus medica | ترنج ، کەبات، درەختێکە لە کۆمەڵەی مزرەمەنی بەرەکەی زەردە و هێلکەیی گەورە و توێکڵ گرنج گرنجە دەکرێت بە شەربەت و مرەبای لێدروست دەکرێت . |
| طرنشول | Sun flower | گوڵەبەڕۆژە، ڕووەکی گوڵەبەڕۆژە. |
| طرنشول الصباغين، عباد الشمس النيلي | Tournesol,Turnsole, | گوڵەبەڕۆژەی خوم، گوڵەبەڕۆژەی چویتی، جۆرێکە لە گوڵەبەڕۆژە ئاوکێکی شین لە قەدەکەی دەردەهێنرێت، کاغەزی گوڵەبەڕۆژەی شینی لێدروست دەکرێت کە بۆ تاقیکردنەوەی کیمیایی بەکاردێت . |
| طرناد، تورنادو | Tornado | گێژەڵووکە، گێژەبا. |
| طرنيق | Turnix | تەرنیك، جۆرە باڵندەیەکی بچووکە. |
| طرنجبين، ترنجبين | Citron-sgueezer | ترنجەبین، شەربەتێکی خۆش و مزرە وەکو ئەسکەنجەبیل . |
| طرنالية | | بڕوانە ( شمرس) . |
| طرنجية، ترنجية، ترنجيل | Citronella | ترنجۆکە، بادروج، بادرنگ، گیایەکی بۆن خۆشە لە دروستکردنی عەتر و سابوندا بەکاردێت ، گەڵاکەی دەکرێتە چاییەوە بۆ بۆن خۆش کردن . |
| طروب | Merry, Lively | کەیف خۆش. |
| طروق، قابل للطرق | Malleable | بەرکوت، مادەیەك بەرکوتە واتە بۆ کوتان و ڕاکێشان دەست بدات، وەکو کانزاکان بە تایبەتی ئاسنی گونجاو، کە دەشێت تەلی باریکی لێدروست بکرێت . |
| طروقية، قابلية الطرق | Malleability | بەرکوتان ، بەرکوتین . |
| طريق ، سبيل | Passage, Road, Way | ڕێگا، ڕێ، ڕێگە. |
| طريق، كروان ذكر | Curlew ( male) | نێرەی کەرەواڵە، باڵندەیەکە. |

| | | |
|---|---|---|
| طريق جبلية ملتوية | | بەروال، چیلەچەپ. |
| طريق ضيق، زقاق | Lane, Alley | کووچە، کۆڵانێکی تەسک. |
| طريق جانبي | Sideway, Lateral way | لاڕێ. |
| طريق عام، طريق كبير | Highway, High road | ڕێگەی گشتی ، شاڕێ، ڕێگەیەکی گەورە. |
| طريق لبنية، طريق التبانة، سكة التبانة، درب التبانة | Milky way | ڕێگەی کاکێشان، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| طري، لين | Soft, Tender, Limp | ئاودار ، تەڕ، ناسک، پاراو، نیان، نەرم و نیان . |
| طريقة، اسلوب | Process, Method | پرۆسە، ڕێچکە، وەکو ئەو ڕێگەیەی کە لە کارگەدا پەیڕەوی دەکرێت بۆ دروستکردنی شتومەك . |
| طريقة القوس، تثبيت الأزوت | Arc process, Nitrogen-fixation | ڕێگەی کەوانە، جێگیرکردنی نایترۆجین بە تێپەڕکردنی هەوا بە کەوانەیەکی کارەباییدا. |
| طريقة كولدشميدت | | ڕێگەی گۆڵدشمیت، تێکەڵاوکردنی تۆزی ئەلەمنیۆم لەگەڵ ئۆکسیدی کانزاکاندا ، لیکۆڵینەوەی ئۆکسیدی کانزا بە هۆی تۆزی ئەلەمنیۆمەوە. |
| طريقة السيانامید | Cyanamide process | ڕێگەی سیانامیدا، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی مادەی سیانامیدی کالیسیۆم . |
| طريقة التلامس | Contact-process | ڕێگەی بەرکەوتن ، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی ترشی گۆگردیك لە دووەم ئۆکسیدی گۆگرد و ئۆکسجین بە یارمەتی پلاتین . |
| طريقة هابر، بوش | Haber-posch-process | ڕێگەی هابەرپۆش، ڕێگەیەکی پیشەسازییانەیە بۆ هێنانە بەرهەمی گازی نەوشادر لە نایترۆجین و هایدرۆجین . |
| طريقة سولفي | Solvay process | ڕێگەی سۆلڤەی، ڕێگەیە بۆ دروستکردنی کاربۆناتی سۆدیۆم ( سۆدەی شتن) لە خوێی چێشت و ئاوگازی نەوشادر و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن. |
| طريقة فيشر، تروبش | Fischer-tropsch-process | ڕێگەی فیشەر- ترۆبش، ڕێگەیەکە بۆ گۆڕینی خەڵووز بۆ گازۆلین ( بەنزین) . |
| طريقة العنصر، الاستشفائي | Tracer-technique | ڕێگەی توخمی چارەکەر، بریتییە لە تەنۆکەیەك یان کۆمەڵە تەنۆکەیەکی تیشکدەرەوەی ئەوتۆ کە لە کاتی ڕۆیشتنیان بەناو لەشدا هەستیان پێ دەکرێت لە دۆزینەوە و چارەکردنی نەخۆشیدا بەکاربێن وەکو بەکارهێنانی توخمی یۆدی تیشکدەرەوە لە ناسینەوە و چارەکردنی نەخۆشی لووی ئایرۆیددا . |
| طريقة باسف | Basf process | ڕێگەی باسف، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی مادەی ئەسیتلین . |
| طريقة هارغريف | | ڕێگەی هارگریڤ، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی ترشی هایدرۆکلۆریك و گۆگرداتی سۆدیۆم . |
| طريقة باير | Bayer process | ڕێگەی بایەر، ڕێگەیەکە بۆ دروست کردنی ئەلەمنیۆم. |
| طريقة بوش، ميزر | Bosch-Meiser process | ڕێگەی بۆش- میزەر، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی یوریا لە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئامۆنیا. |
| طريقة بيشوف | Bischof process | ڕێگەی بیشوف، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی کاربۆناتی قوڕقوشم . |
| طريقة جافة | Dry process | ڕێگەی وشك ، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی چیمەنتۆ . |
| طريقة ديكون | | ڕێگەی دیکۆن، ڕێگەیەکە بۆ دەرهێنانی گۆگرد لە ژێر زەویدا. |
| طريقة فراش | Frasch process | ڕێگەی فراش، ڕێگەیەکە بۆ دەرهێنانی گۆگرد لە ژێر زەوی. |
| طريقة كازال | Casale process | ڕێگەی کازال، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی ئامۆنیا. |
| طريقة كرول | Kroll process | ڕێگەی کرۆل، ڕێگەیەکە بۆ پوختەکردنی توخمی تیتانیۆم. |

| | | |
|---|---|---|
| طريقة كلدال | Kjeldah | ڕێگەی کلدال ، ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی ڕێژەی نایترۆجین لە ناوێتە ئەندامییەکاندا . |
| طريقة كلود | Claude process | ڕێگەی گلۆد، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی گازی ئامۆنیا . |
| طريقة كولبرن | Colburn process | ڕێگەی کۆلبرن، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی شووشەی تەخت ( تەبەقی شووشە). |
| طريقة لبلان، طريقة لوبلان | Leblanc process | ڕێگەی لیبلانك، ڕێگەی لۆبلان، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی کاربۆنی سۆدیۆم واتە سۆدەی شتن. |
| طريقة لندي | Linde process | ڕێگەی لیندی، ڕێگەیەکە بۆ ئامادەکردنی نایترۆجین و ئۆکسجین لە هەوا. |
| طريقة لين | Lane process | ڕێگەی لێن، ڕێگەیەکە بۆ ئامادەکردنی گازی هایدرۆجین لە ئاسن و هەڵمی ئاو. |
| طريقة مبتلة، طريقة رطبة | Wet process | ڕێگەی تەڕ، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی چیمەنتۆ بە جۆرێکی ئەوتۆ کە کەرەسە خاوە هاڕاوەکان لەگەڵ ئاودا تێکەڵ دەکرێن پێش سوتانیان . |
| طريقة كرام | | ڕێگەی گرام، ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەیی جۆری باکتریا. |
| طريقة شيفر | Sc | ڕێگەی شافەر، جۆرێکە لە هەناسەپێدانی دەستکرد. |
| طريقة البحث العلمي | Scientific method | ڕێگەی کولێنەوەی زانستیانە. |
| طريقة التقدير | Rating method | ڕێگەی خەملاندن. |
| طريقة المحاولة و الخطا | Trial and error method | ڕێگەی هەڵە و ڕاست، لە زانستی دەروونیدا واتە لە دەروون ناسیدا بەکاردێت . |
| طريقة الأسفاد، طريقة التسافد | Method of breeding | ڕێگەی جووت پێگرتنی گیاندار ، ڕێگەی زاوزێ کردنی گیاندار . |
| طريقة مارش | Marsh process | ڕێگەی مارش، ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی بڕی زەرنیق لە لەشی مرۆڤدا . |
| طريقة لزجة | Viscose-process | ڕێگەی ڤیسکۆس ، بۆ دروستکردنی ( ڕایۆن) واتە ئاوریشمی دەستکرد . |
| طريقة كانزارو | Cannizzaro-method | ڕێگەی کانزارۆ، ڕێگەیەکە بۆ دەرهێنانی شێوگی گەردیی مادەکان . |
| طريقة ديلونك وبتي، قانون ديلونك وبتي | | ڕێگەی ( یاسای) دۆلۆنگ و پیتی ، ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی کێشی گەردیلەی توخمەکان . |
| طريقة بريل | | ڕێگەی بریل، ڕێگەیەکە بۆ ئەوە بەکاردێت کە مرۆڤی کوێر فێری خوێندن بکات. |
| طريقة باتينسون | Patt | ڕێگەی پاتینسۆن، ڕێگەیەکە بۆ لابردنی زیو لە قوڕقوشم . |
| طريقة باركس | | ڕێگەی پارکیس، ڕێگەیەکە بۆ لابردنی زیو لە قوڕقوشم . |
| طريقة كوي | Gouy method | ڕێگەی گۆی، ڕێگەیەکە پەیوەندی بە خەسڵەتی لێشاوی موگناتیس و کایەی موگناتیس و گۆزەرداریی مادە پیشان دەدات . |
| طريقة موليكن | Mulliken-process | ڕێگەی مولیکن، ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی سالبێتی کارەبایی گەردیلەی هەندێك لە توخمەکان . |
| طريقة التجزي | Peptization, peptesation | ڕێگەی لەت و پەت کردنی سۆڵەمڵە ئاونەویستەکان بە تێکردنی مادەیەکی ئەلەکترۆلیتی ، واتە گۆڕینی مادە بۆ شلەیەکی نیمچە مڵ . |
| طريقة برين | Brin process | ڕێگەی برین، ڕێگەیەکە بۆ ئامادەکردنی ئۆکسجین لە گەرم کردنی ئۆکسیدی باریۆم لە هەوادا . |
| طريقة براج (براك) | | ڕێگەی براگ، ڕێگەیەکە بۆ دیاری کردنی سیستەمی بلووری بە بەکارهێنانی تیشکی سینی . |
| طريقة الحفر الرحوي | Rotary drilling process | ڕێگەی هەڵکەندن بە خولانەوە، وەکو هەڵکەندنی بیری نەوت بە دەزگایەك کە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە . |

| | | |
|---|---|---|
| طريقة الحفر بالدق | Cable, Tool-drilling, Percussion drilling, Churn drilling | ڕێگەی هەڵکەندن  بە کوتان، ڕێگەیەکە بۆ هەڵکەندنی زەوی بە کوتان بە مەکینەی قورس |
| طريقة التنقيب الزلزالية | Seismic method of exploration | ڕێگەی بومەلەرزەیی، بۆ گەڕان بە شوێن نەوتدا لە زەویدا . |
| طريقة مليكان ، تجربة مليكان | Millikan-experiment | ڕێگەی میلیکان، تاقیکردنەوەی میلیکان ، ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی ڕێژەی بارگە لەسەر بارستە یان بڕی بارگەی ئەلیکترۆن بەم ڕێگەیە بارستەی ئەلیکترۆن دۆزراوەتەوە . |
| طريقة  الغرف الرصاصية | Lead chamber- process | ڕێگەی ژووره قورقوشمی‌یەکان ، ڕێگەیەکە بۆ ئامادەکردنی ترشی گۆگردیك ( کبریتیك) لە دووەم ئۆکسیدی گۆگرد و ئۆکسجین و ئاو بە یارمەتی ئۆکسیدەکانی  نایترۆجین . |
| طريقة وزنية | Gravimetric-method | ڕێگەی کێشیی، ڕێگەی بڕیی، ڕێگەیەکە لە شیکردنەوەی بڕیی ئاوێتە کیمیایی‌یەکاندا بەکاردێت بۆ دۆزینەوەی کێش یان ڕێژەی کێشی ئەو ئاوێتانە . |
| طريقة الاستكشاف المغناطيسي | Magnetic method of exploration | ڕێگەی دۆزینەوەی موگناتیسیانە، ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی کەرەسەی خاوی کانزاکان . |
| طريقة باور–بارف | Bower-Barffing-process | ڕێگەی بۆوەر–بارفینگ، ڕێگەیەکە بۆ نەهێشتنی داخوران لە کەل و پەلی ئاسندا . |
| طريقة بولتون | Boulton process, | ڕێگەی بۆلتون، ڕێگەیەکە  بۆ پاراستنی تەختە . |
| طريقة ا.ب.ج | A.B.C process | ڕێگەی ئەی، بی، سی، ڕێگەیەکە بۆ چارەسەرکردنی ئاوی زێراب و ئاودەستخانە بە بەکارهێنانی زاخ یان قوڕ بە شێوەی مادەی نیشێنەر . |
| طري، جديد | Fresh, New | تازە، نوێ . |
| طريقة ، منهج | Way, Manner, Method, Means | ڕێباز، ڕێگە، شێن . |
| طريقة استقرائية | Inductive-method | ڕێگەی شوێن کەوتنی شتی بچووك بۆ گەیشتن بە  بڕیارێکی گشتی ، واتە ڕێگەی لیکۆلینەوە لە شتی تایبەتی‌یەوە بۆ شتی گشتی . |
| طريقة استنتاجية | Deductive-method | ڕێگە بۆ دەرکەوتن ، ڕێگەی وەرگرتنی بڕیاری  تایبەتی لە بڕیاری گشتی‌یەوە . |
| طريقة بسمر، محول بسمر | Bessemer-process | ڕێگەی بسەمەر، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی  پۆلاً لە ئاسنی خاو . |
| طريقة موند | Mond process | ڕێگەی مۆند، ڕێگەیەکە بۆ پوختەکردنی کانزای نیکل بە هەڵماندن . |
| طريقة ڤان اركل | Van Arkel process | ڕێگەی ڤان ئەرکل ، ڕێگەیەکە بۆ پوختەکردنی کانزای زرکۆنیۆم بە هەڵماندن . |
| طريقة بوش | Bosch process | ڕێگەی بۆش، بۆ جیاکردنەوەی گازی هایدرۆجین لە گازی ئاو . |
| طريقة سيمنز–مارتن | Siemens-martin- process | ڕێگەی ( سیمنز– مارتن) ، ڕێگەیەکە بۆ دروستکردنی پۆلاً لە ئاسن . |
| طريقة الحث الكهربائي، طريقة التاثير الكهربائي | Electro-induction method | ڕێگەی کارتێکردنی کارەبای. |
| طُريح | | بڕوانە ( سرح) . |
| طريح الفراش | Bedridder | لە جێگا داکەوتوو ، نەخۆش . |

| | | |
|---|---|---|
| طريح ، طريغلا، سنطرة | Trigla, Gurnard, Red surmulet | ( تريگـلا ) ، ماسـىيەكى دەريـاى سـەر زلـە ، پەرەكەكـەى دركـاوى و گۆشتەكەى خۆشە دەخورێـت لەبەرئەوە سوێر دەكرىٚ بۆ هەڵگرتن گەلێك رەنگى هەيە وەكو سوور و پەمەيى و زەرد و سەوز و زيويى و سپى . |
| طريح، مطروح | Thrown | كەوتوو، راكشاو . |
| طريد، مطرود | Driven away | دەركراو . |
| طريدة | Chased-game | تەرەبوو، ئەو گياندارەيە كە لە دەست راوكەر رادەكات . |
| طريدة الباب | Head-rail | سەردەرگا. |
| طريدان، ليل و نهار | Night and day | شەو و رۆژ . |
| طرية، طولق | Torreya | ( تۆريـا ) ، درەختێكى هەميشـە سـەوزە لـە كۆمەڵـەى سـنەوبەر ئەگـەر گەڵاكـەى بپروێـنرێت بۆگـەن دەردەدات ، بەرەكـەى لـە گوێـز دەچێـت رەنگەكەى سەوز يان زەردە پەڵەى سپى تيادايە . |
| طرية كاليفورنيا، جوز الطيب الامريكي | California-nutmeg | گوێزبـۆى ئـەمريكى ، جۆرێكە لـە درەخـتى ( توريـا ) بەرەكـەى لـە گوێـز دەچێت . |
| طريف ، حديث | Newly | تازە، نوىٚ. |
| طريف، غريب، نادر | Rare, Uncommon, unique | ناياب، هەڵكەوتوو ، بەنرخ ، دەگمەن . |
| طريم | Root-rothoney-agaric | جۆرە كەڕوويەكى زيان بەخشە لە درەخت و سەوزە دەدات . |
| طست فخري | Earthenware-lever | سوێنە، تەشتێك لە گڵێنە دروست كرابێت . |
| طست صغير | Small lever | تەشتۆڵكە ، لەگەن، لەنگەرى . |
| طست ، طشت | Basin, wash-bowl, Lawer, Bidet | تەشتى مس، تەشتى گەورە، تەشت، بەرۆڵە. |
| طست و ابريق | Jugand basin | لەگەن و مەسينە، مەسينە و لەگەن . |
| طسمة، مسن الموس | Strop, Razor-strop | قايشى چەقۆ تيژكردن و پارچە چەرمێكە چەقۆى پىٚپەرداخ دەكرێت . |
| طسمان ، دسمان، طسمان المسك | Desman, Mygoale-moschata | ( ديٚسمان) ، گياندارێكى مێروو خۆرە لە كۆمەڵەى مشكەكوێرە لە قەراغ رووبار و دەرياكاندا دەژى هێندەى سمۆرەيەكى گەورە دەبێت، رەنگەكەى قاوەيىيە، پێستەكەى بە نرخە لە بنى كلكيدا لوويەكى هەيە مادەى مسكى بۆن خۆشى لىٚدەردىٚهێنرێت، لە ژێر قەراغى ئاودا قوموش لىٚدەدات . |
| طشت | | بڕوانە ( طست) . |
| طشيش | Scorch | هەڵقرچان ( بە ئاگر يان بە گەرمى ) . |
| طعام | Food, Nourishmant, Cooked-food, Aliment | خواردن، خۆراك، چێشت، شێو، خواردەمەنى ، تێشت . |
| طعام معلب، معلبات | Tinned foods | خواردەمەنى قوتوو. |
| طعام للطريق | sions | توێشوو، خواردەمەنى بۆ رێگە . |
| طعام الصباح ، فطور | Breakfast | نانى بەيانى ، بەرچايى، خواردەمەنى نانى بەيانى |
| طعام الغداء، طعام الظهر | Lunch | نانى نيوەڕۆ، قاوەڵتى . |
| طعام العشاء، طعام المساء | Dinner, Supper | نانى ئێوارە و فراڤين ، فراوێن . |
| طعم، مذاق | Taste, Tang | تام، چەشتن، چێژ. |
| طعم كريه | Cacogeusia | تامى ناخۆش ، تامى بۆگەن . |
| طعم حلو | Glycogeusia | تامى خۆش . |

| | | |
|---|---|---|
| طُعم | Bait, Lure, Decay | چەشە، چەش، کچوولە، دان، چێشتەدانەخۆرە، ڕاوکە، دانی ژەهراوی کە بۆ کوشتنی گیانداری زیان بەخش بەکاردێت. |
| طعم الفار ، سم الفار | Ratbane, rat poison | مەرگەموش ، ژەهری مشك، دەرمانی مشك. |
| طعوُمة | Fatten cattle | دابەستە، ئاژەڵێك کە بۆ قەڵەوکردن بەخێو بکرێت . |
| طعم النبات | Graft, Scion , Cion | گۆیکە یان خەڵف بۆ متوربەکردن . |
| طُعم، لقاح | Vaccine | پێکوت، دەرمانی کوتان دژی نەخۆشـی وەکـو ئاوڵـە کـە بریتی‌یـە لـە میکرۆبی کوژراو یان لاوازکراو یان ژەهرەکەیان . |
| طعن بالرمح او السكين | To stab, Thrust, Pierce | لێدان بە چەقۆ یان ڕم . |
| طعن بالحربة | To thrust with lance | لێدان بە قەمە، لێدان بە سونگی . |
| طعن بالخنجر | Stab with a poniard, To poniard | لێدان بە خەنجەر . |
| طُغراء،ئ طغري، طرة | Monogram, Cipher | مۆر، دامغە، تامغە، نیشانەیەکە بۆ کەسێك بریتی‌یە لە پیتە یەکەمی‌یەکانی ناوەکەی بە شێوەیەکی تۆڕیی ڕەنووس کراون . |
| طغار | Ten kilograms | تەغار ، ( کغم ) ٣٠ ربە ، دقیە . |
| طُغمة، زمرة | Tagma, party, Faction, Band | کۆمەڵە ، تاقم |
| طغموس، غورلا، غول | Gorilla | ( گۆریلا ) ، گەورەترین مەیمونە لە ئادەمیزاد دەچێت. |
| طُغیان، ظلم | Tyranny, Oppression | ستەم، زوڵم کردن ، زۆرداری. |
| طغیان ( للماء) | Overflow, inundation | ئاوسەرکردن . |
| طفاوة، جُفاء | Scum | بەڵغ، کەف ، دۆووکی ڕۆن و کەرە. |
| طفاوة الشمس ، هالة دارة الشمس | Halo | خەرمانەی خۆر، جۆخینەی خۆر . |
| طفاوة البحر، عوالق | Plankton | ( پلانکتۆن ) ، بەڵغی دەریا، ئەو گیاندار و ڕووەکە وردانـەی کـە بەسـەر ڕووی ئاوەوە گیرساونەتەوە یان سەرئاوکەوتوون . |
| طفاحة، رغوة | Scum, Skimmings | کەف، کەفی سەر خواردەمەنی و شلەی کوڵاو . |
| طفال، طین خزفي | Clay | قوڕی وشك، گڵ کە بۆ دروستکردنی دیزە و گۆزە بەکاردێت. |
| طفارة، قفازة | Zamenis | تیرەمار، مارێکی باریکی درێژە باز دەدات لە نێوان بەرد و لەدا ، ماسی و بۆق و مارمێلکە دەخوات . |
| طفالة، قصاعة | Infantilism | منداڵ ئاسایی، بەردەوام بوونی ڕەوشتی منداڵی لە کەسێکدا هەتا دوای بلوق بوونیش. |
| طفاثة | Acridity, Astingency | تفتی ، وەکو لە میوەی پێ‌نەگەیشتوودا . |
| طفاية، مطفاة ، آلة إطفاء الحريق | Extinguisher, Fire-engine | ئامرازی ئاگر کوژاندنەوە . |
| طُفة، طوفا | Tufa | ( تووفا)، بەردێکی کون کون یان بتەوە لەناو یان لە دەورووپشتی کانی‌یە کانزای‌یەکاندا دەنیشێت . |
| طف، طفة | Tuff | ( تـەف) ، مادەیـەکی ڕەقـە لـە گڕکانەکانـەوە دەهاوێژرێتـە دەرەوە چـەند جۆرێکی هەیە . |
| طفح ، طفوح | Overflowing | لافو، زۆرپڕبوون . |
| طفح وردي ، حُمامي | Erthema | لیر، نەخۆشی‌یەکی پێستە، پەڵەی پەمەیی لەسەر پێست پەیدا دەکات . |
| طفح جلدي ، طفح قراصي | Rash, Nettle rash | لـیر، پـەیدابوونی پەڵـە لەسـەر پێسـت لـە ئـەنجامی بەرکـەوتنی هـەندێك ڕووەکەوە وەکو ڕووەکی گەزنە . |

| | | |
|---|---|---|
| طفح جلدي | Eruption, Yaws | پەڵەی پێست، لیر، لیرگ، گەرمەژنە، تلۆق، تامیسك، زیپكە، پەڵەی سوور، بلۆق، راش . |
| طفحة، شري | Urticaria | زیپكە بە ئاوسانێكی كەم و خورووەوە . |
| طفح ، موات طفحي | Exanthema | نەخۆشی‌یەكە لە ڕووەكە مزرەمەنی‌یەكاندا، لە ئەنجامی ئارێكی خۆراكەوە شانەكانیان زەمقیان لەسەر پەیدا دەبێت و گەڵاكانیشیان پەڵەی قاوەیی . |
| طفح ، حمم بركانية | Lava | ( لاڤە) ، ئەو كانزا تواوە گڕگرتووانەی كە گڕكانەكان دەپرژێنە دەرەوە لە كاتی هەڵچووندا . |
| طفر، طفرة، وثب | To jump, Leaping , Skipping, Bounding | قەڵەمباز، قەڵبەز، بازی بەرز ، بازدان ، گومەتە. |
| طفر ، ثفر | Crupper | پاشوو، پشتێنی دواوەی زین . |
| طفرة وراثية | Mutation Germinal | بازدانی زگماكی ، بازبردن، گۆڕینێكی خۆیی كتوپڕی‌یە لە كرۆمۆسۆمەكاندا ڕوودەدات ، قەڵەمباز، گۆڕانێكی كتوپڕی ، گۆڕانی سیفەتی زیندەوەرێك بە شێوەیەكی ئەوتۆ كە سیفەتە تازەكە لە نەوەیەكەوە بچێت بۆ نەوەیەكی تر . |
| طفرة، تغير فجائي | Mutation | بازدان:<br>١. گۆڕانێكە لە جینە زگماكی‌یەكاندا ڕوودەدات كارێكی ڕاستەوخۆ دەكاتە سەر زیندەوەر وەكو لە پەیدابوونی ڕەوشتی تازەدا .<br>٢. گۆڕانێكی زگماكی‌یە لە ڕەوشتی جینەكاندا لە ئەنجامی گۆڕان لە جینەكەدا لە شوێنێكدا یان لە ئەنجامی گۆڕان لە پێكهاتنی كرۆمۆسۆمدا. |
| طفرة المراهقة | Adolescent-spurt | بازدانی هەرزەكاری، گەورەبوون و گەشەكردنی مرۆڤ بە تایبەتی لە بالادا لە ساڵەكانی سەرەتای قۆناغی هەرزەكاریدا . |
| طفرة جنينية | Embryonic-mutation, Embryonal-mutation | بازدانی كۆرپەلەیی، بازدانی پسی . |
| طفرة مفتعلة | Induced-mutation | بازپێدانی دەستكرد ، بۆ مەبەستی خوێندن و لیكۆڵینەوە . |
| طفشانة | Picklock, Skeleton key | ئامرازی كردنەوەی قفڵ . |
| طفل | Baby, Child , Bab, Infant | منداڵ ، كۆرپە، زارۆ، زارۆڵە، بەبلە، بەچە. |
| طفل غير عادي ، طفل غير سوي | Exceptional-child | منداڵی نائاسایی، واتە یان بەهرەدار بێت یان دواكەوتوو. |
| طفل رضيع | Nursing, Infant, Baby | منداڵی شیرەخۆرە ، منداڵی ساوا، تیتلە، بیبیلە، زارۆ، زارۆڵە. |
| طفل اول | First-born | نۆبەرە، بەرمزا، منداڵی نۆبەرە. |
| طفل اخير | Last-born | پاشەبەرە، منداڵی دواوە . |
| طفل أزرق | Blue baby | منداڵی شین، ئەو منداڵەیە كە لە دایك دەبێت شین هەڵدەگەڕێت چونكە نەخۆشی دڵی لەگەڵدایە وەكو ئەوەی كە كون هەبێت لە نێوانی هەردوو زگۆڵەی دڵی‌دا . |
| طفل ، اصيل | Sunset, Setting , Decline | زەردەی هەتاوبەر ، سووربوونی خۆر پێش ئاوابوون. |
| طفلق ، اشران، زلائف الملوك، خبز القاق ، سُرة | Cotyledon, Kidney-wort, Penny worts | گیاناوك، گیا گورچیلە، گیایەكی دەشتەكی و ڕازاندنەوەیە گەڵاكەی گۆشتنە گوڵەكەی بە شێوەی هێشوو شۆڕە بەڕەنگی سوور یان پەمەیی دەرمانی لێدەردەهێنرێت بۆ چارەكردنی ڤێ ، هەروەها بۆ بەهێزكردنی ئارەزووی ڕەگەزی |

| | | |
|---|---|---|
| طفل ، اطفال ، صلصال | Clay, Potter Argil | قوڕ . |
| طفل ، طين صفحي | Shale | بەردێكی نیشتووە ( قوڕێكی ووشكەوبووە) بە شێوەی چینی تەنكی ئەوتۆ كە بە ئاسانی لە یەكتری جیابكرێتەوە لە بنەڕەتدا لە كەرەسەی خاوی كانزایی پێكهاتووە . |
| طفل رملي | Loam | قوڕی لمی ، هەویرێكە لە قوڕ و ئاو ولم و كا لە دروستكردنی خشتدا بەكاردێت . |
| طفو، عوم | Emersion, Floating, Buoyancy, Floatation | سەرئاوكەوتن . |
| طفولة، طفولية | Infantile, Babyhood, Infancy | منداڵیی، سەردەمی منداڵی . |
| طفوية | Buoyancy | توانای سەرئاوكەوتن ، بۆ نمونە هەرچەندە پۆلاّ حەوت ئەوەندەی ئاو قورسە كەچی كەشتی پۆلاّیی سەرئاو دەكەوێت چونكە ناوەكەی بۆشە . |
| طفيل | Mud | قوڕ . |
| طفيلي الملاريا، مصورة طفيلي الملاريا الخبيثة، مصورة منجلية | Plasmodium, Plasmodium-falciparom | ( پلاسمۆدیۆم) ، مشەخۆری مەلاریا، مشەخۆری لەرزوتا ، مشەخۆری مەلاریای پیس یان مەلاریای گران |
| طفيلي (طفيليات) | Parasite, Sponger, Hangeron | مشەخۆر، هەوانتەخۆر، لاكوت، لاوورگە، مرووموشكەر ، ملۆمووشكەر ، خۆژێ، چەل و مەل، ناخۆنەك لێدەر، خۆرە، تەرفە، پەڵەندەر ، مفت خۆر، مەڵۆس زیندەوەرێك ( گیاندار یان ڕووەك) كە لەسەر زیندەوەری تر بژی و زیانی پێبگەیەنێت وەكو مشەخۆری لەرزوتا ( گیاندارە) و دەموكانە (ڕووەكە) . |
| طفيلي حمى الثلث، مصورة بيضوية | Plasmodium ovale | مشەخۆری سێبەڕۆ، مشەخۆری سێ یەكەتا، جۆرێكە لە لەرزوتا بە سێ ڕۆژ جارێك سەر لە نەخۆشەكە دەدات . |
| طفيلي حمى الربع، مصورة وبالية | Plasmodium-malarae | مشەخۆری چواریەكەتا، جۆرێكە لە لەرزوتا بە چوار ڕۆژ جارێك سەر لە نەخۆشەكە دەداتەوە . |
| طفيلي مرض النوم | Trypanosoma | ( ترپیانۆسۆما)، مشەخۆری نەخۆشی نوستن . |
| طفيلي البثرة الشرقية ، طفيلي حبة بغداد | Leishmani-tropica | مشەخۆری كانی ( كوانی ) خورما. |
| طفيلي الجرب | Mangemites | مشەخۆری گەڕیی ، جۆرە سچێكە دەبێتە هۆی نەخۆشی گەڕی . |
| طفيلي مُجبر | Obligatory-parasite | مشەخۆری بە زۆریی، مشەخۆری ناچار. |
| طفيلي مخير | Facultative-parasite | مشەخۆری بە ئارەزوو . |
| طفيلي خارجي | Ectoparasite | مشەخۆری دەرەكی، ئەو مشەخۆرەی كە لە سەر دەرەوەی لەش دەژی . |
| طفيلي داخلي | Endoparasite | مشەخۆری ناوەكی ، ئەو مشەخۆرەی كە لە ناوەوەی لەشدا دەژی. |
| طفيلي الزحار، اميبا الزحار | Entamoeba-hystolytica | مشەخۆری زەحیری ، ئەمیبای زەحیریی. |
| طفيلي دموي | Hematozoon | مشەخۆری خوێن، هەر مشەخۆرێكی گیانەوەری لە خوێندا بژی . |
| طفيف | Small, Little, Slight | كەم، كز، سووك، ناتەواو. |
| طفية | Echis | جۆرە مارێكی ژەهرینی پیسە ڕەنگەكەی قاوەییە دوو هێڵی ڕەش یان سپی تێدایە . |

| | | |
|---|---|---|
| طقس ، جو | Weather | کەش، باگۆڕکی، جەبەرە، باری کەش لە ڕووی پەستان و پلەی گەرمی و شێ و با و هەڵم و تەم و باران و بەفرەوە . |
| طقس ممطر | Rainy Weather, Showery weather | تەڕووتووش، کەشی باراناوی. |
| طقس معتدل | Temperate-weather | خۆشیانی ، کەش خۆش . |
| طقس ديني، طقوس دينية | Liturgy, Ritual, Rite | داب و دەستووری ئایینی . |
| طقسوس، زرنب، فُشاغ | Taxus, Yew tree | هەڤریسك، عەرعەر، درەختێکی هەمیشە سەوزە لە کۆمەڵەی سنەوبەر، تەختەکەی بە نرخە بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان ئەڕوێنرێ، گەڵاکەی ژەهردارە و بەرەکەی هێندەی نۆکێك دەبێت. |
| طقسوديون، شجرة السرو السوداء | Taxodium , Baldcypress, Black cypress | ( تاکسۆدیۆم ) ، سەرووە ڕەشە، جۆرێکە لە داری سەروو دەرمانی لەرزوتا و نەخۆشی جگەر لە گەڵا و تۆوەکەی دەردەهێنرێت . |
| طقطق، اريل، فشفاش، قابضة، زهرة القبض | Statice | گیایەکی سەلکدارە گوڵی سووری وورد دەگرێت . |
| طقطقة | Crepitation, crackling, Knocking | تەقەتەق، شەقەشەق. |
| طقطوقة، اغنية خفيفة | Lightor comic, Song, Ditty | بەستە، گۆرانییەکی سوکەڵە. |
| طقطقية | Chettusia | ( چیتوسیا)، جۆرە باڵندەیەکی لاق درێژە لە زیقاوڵە دەچێت ، کلکی کورتە باڵ و پشتەکەی قاوەییە ژێر سکی سپییە لە قەراغ ئاودا دەژی . |
| طقطوقة، طرطوعة، العاب نارية | Cracker bonbon, Cracker, Fireworks | فیشەکەشێتە، یاری ئاگرین . |
| طقطوقة السجاير، منفضة السجاير، نفاضة السيكاير | Ash tray | تەپڵەکی جگەرە. |
| طقم | Set, Outfit | تاقم ، دەستە. |
| طقم أوزان (عيارات) | Tagma, Set-of weight | تاقمی سەنگ ( قوتوپەکە سەنگی جۆراوجۆری تیادایە) . |
| طقم الاسنان | Odonthercos, Denture, Dentalplate | تاقمی ددان . |
| طقم تحضير الغازات | Gas preparation-kit | تاقمی ئامادەکردنی گازەکان ، تاقمی ئەو دەزگا و ئامرازانەی کە بۆ ئامادەکردنی گازەکان بەکار دەهێنرێن . |
| طقم سفرة، طقم أدوات المائدة | Dinner service | تاقمی کەل و پەلی سفرە ( مێزی نان خواردن) . |
| طقم الشاي | Tea-set | تاقمی چایی، کەلوپەلی چای . |
| طقم ضوء | Kit of light | تاقمی ڕووناکی، سندوقێکە ئەو دەزگا و ئامرازانەی تیایە کە بۆ تاقیکردنەوە لەسەر زانستی ڕووناکی بەکاردەهێنرێن . |
| طقم كهربائية و مغناطيسية | Kit of electricity and magnetism | تاقمی کارەبا و موگناتیس ، سنوقێکە ئەو ئامراز و دەزگایانەی تیادایە کە لە زانستی کارەبا و موگناتیسدا بەکاردەهێنرێن . |
| طقم ميكانيك | Kit of mechanic | تاقمی میکانیك ، سنوقێکە ئەو ئامراز و دەزگایانەی تیادایە کە لە زانستی میکانیکدا بەکاردەهێنرێن . |
| طقم حرارة | Kit of heat | تاقمی گەرمی ، سنوقێکە ئەو ئامراز و دەزگایانەی تیادایە کە لە زانستی گەرمیدا بەکاردەهێنرێن . |
| طقم الحصان، عدة الحصان | Harness | کەلوپەلی وولاخ ، کەلوپەلی زین |

| | | |
|---|---|---|
| طقيق | Terebinth | قەزوان و چەقالە . |
| طلا، طلاوة | Leukoplakia, Alphelasma, Leukoplasia | پەڵاس، بەڵغ، توێژاڵێکی سپی تەنکە لەسەر زمان پەیدا دەبێت لە کاتی نەخۆش کەوتندا |
| طلا ، طلو | Fawn | بەچکەی گیانداری سمدار وەکو ئاسك |
| طلاء خزفي، ميناء، جوهر الزجاج | Enamel | مینا، ڕووکەشی فەخفوری |
| طلاء، دهان | Liniment, Unguent, Coat, Paint | هەر مادەیەك بۆ ڕووکەش کردن یان چەورکردن بەکار بێت . |
| طلاء الرطوبة، مانع الرطوبة | Damp proof-coating | دژەشێ ، هەر مادەیەکی یان بۆیەیەك دژی شێ بەکاربهێنرێت . |
| طلاء بالكروم | Chromium-plating | ڕووکەش کردن بە کرۆم، کرداری ڕووکەش کردنی پۆلاً ( یان کانزای تر) بە چینێکی تەنکی سپی مەیلە و شین لە کانزای کرۆمی بۆ جوانی دژی ژەنگ. |
| طلاء بالفضة | Silver plating | ڕووکەش کردن بە زیو، کرداری ڕووکەش کردنی پۆلاً (یان کانزای تر) بە زیوو |
| طلاء بالنيكل | Nickel plating | ڕووکەش کردن بە نیکل . |
| طلاء كهربائي، طلي كهربائي | Electro plate, Electro plating | ڕووکەشی کارەبایی، ڕووکەش کردن بە کارەبا . زڕکفت کردنی کارەبایی ، وەکو داپۆشینی ئامرازێك لە کانزایەکی هەرزان بە چینێکی تەنك لە کانزایەکی گرانی وەکو زێڕ بە ڕێگەیەکی کارەبایی . |
| طلاء زجاجي | Glaze | ڕووکەشی شووشەیی، ڕووکەش کردنی سیرامیك بە چینێکی شووشەیی لێڵ یان ڕوون بۆ ئەوەی سیرامیکەکە بەهێزتر و جوانتر بێت و بە ئاسانی پاك بکرێتەوە . |
| طلاء الاظافر | | بڕوانە ( صبغ الاضافر). |
| طلا | Wine, Liquor | مەی . |
| طلاطلة، طنطلة، لهاة | Uvula | بەرگە ، زمانە چکۆلە، زیادە گۆشتێکی قووچەکی جووڵاوەیە لە دەرگای گەرووداً لە دواوەی دەمدا . |
| طلاق ، تطليق | Divorce | تەڵاقدان ، تەڵاقدانی ژن . |
| طلاقة اللسان | Volubility, Fluency of speech | زامن ڕەوانی . |
| طلام ، تنوم، قنبز | Hemp-seed | دەنکی شادانە، تۆوی ڕووەکی گوش یان بەنگ. |
| طلب | Seeking, looking for, Request, Demand | داواکردن ، داواکاریی ، خواستن . |
| طلب جنسي (لدى الحيوان) | Rut | ئاڵوشی ڕەگەزی، کەڵ خواردن ( بۆ مانگا) ، بەران خواردن ( بۆ مەڕ) تەگەخواردن ( بۆ بزن) ، هاتنە با (بۆ پشیلە) هێچرکردن (بۆ ئاسك). |
| طلة | Agreenable aroma | بۆنی خۆش. |
| طلح، طليح، لبود | Ixoddes, Tick | جۆرێکە لە گەنە لەسەر پێستی سەگ و ئاژەڵ دەژی. |
| طلح، موز | Banana | مۆز، ڕووەکێکی گیایی گەورەیە بەرێکی درێژکۆڵەی شیرینی مەیلەو لینجی هەیە، بەرەکەی بە شێوەی هێشووە . |
| طلحة، طلاح، سيال، سنط صمغي، ام غيلان، شجر السمر | Shittah tree, Acacia seyal, Acaciagummiferia,Acacia-arabica | دارگەون، درەختێکی گەورە و دڕکاوییە، کەتیرە ( زەمق) ی لێدەهێنرێ بەرەکەی شیرینە . |
| طليحة | Sheet of paper | تەبەقە کاغەز. |

| | | |
|---|---|---|
| طلخ | Muddy water | ١. قوڕە ڕەش، قوڕاوێکی بۆگەن . <br> ٢. پاشماوەی ئاو لە حەوز و ئەستێلکدا کە بووبێتە شوێنەوارێك بۆ بۆق و چرپوجانەوەر |
| طلسم ، كتابة سحرية | Talisman, Charm | نیرەنگ، تەلیسم، ئەفسوون، جادوو، دەم بەست، سیحر، نوشتە. |
| طلسمية ، هندباء زرقاء | Blue succory | تاڵێشکە شینە، گیایەکە گوڵی شین دەگرێت . |
| طلسة | Bot rytis | ( بوتریتیس ) کەڕوویەکی زیان بەخشە بە ڕووەك. |
| طلع النبات ، صواح | Pollen grain | هەلآڵەی گوڵ، تۆوی نێرەکی گوڵ. |
| طلع النخل | Spadix | هەلآڵەی دارخورما . |
| طلق ، طليق | Free, Astatic | بەرەلا ، ئازاد، سەرەبەست . |
| طلق | Labour, Pains , Travail, Throes of child-birth | ژانی منداڵبوون ، ژان گرتن . |
| طلق عبث | Primary labour | بەرەژان، سەرەتای ژانی ئافرەت لە کاتی منداڵ بووندا . |
| طلقة نارية ، خرطوشة | A shot, Cartridge | گوللە، فیشەك |
| طلق ، حشوة السلاح الناري | Charge | داگرتنەوەی تفەنگ بە ساچمە یان باروت یان گوللە . |
| طلق اللسان | Loguacious, Voluble | زمان ڕەوان، قسەکەر ، بگۆ، بە زمان ، گۆیندە. |
| طلق ، تالك | Talc, Talcum, French chalk | تالك، بۆدرە، کلێکی سپیە لە مادەی مەگنیسیوم سلیکەتی ئاویی پێکهاتووە بۆ ئارایشت و دەرمان و بۆیە و دروستکردنی فەخفوری و لاستیك و کاغەز بەکاردەهێنرێت . |
| طلق، ميكا | Mica | میکا، مادەیەکی نیمچە شووشەیەیە بە شێوەی توێژاڵی تەنکە بە شێوەی دابڕکەری کارەبایی بەکاردێت بریتییە لە سلیکاتی چەند کانزایەك کە لە پێکهاتندا جیاوازن و لە ڕەوشتدا لە یەکتری دەچن . |
| طلل | Ruins, Remains | کەلاوە ، تەپۆلکە، وێرانە، پاشماوەی دێرین، ئاسەوار. |
| طل، ندى كثيف | Thick mist | ئاورنگێکی چڕ ( خەست). |
| طل، مطر خفيف | Drizzle, Fine-rain | سوکەباران، نمەباران . |
| طلم ، طليان | Tartar of teeth , Yellow in crutation on teeth | چڵکی ددان ، زەردیی ددان،ڕەشی ددان . |
| طلمبة، مضخة | Water-pump, Pump | ترومپا ، ئامرازی شلە هەڵێنجان . |
| طلمبة بمروحة، نابذة | Centrifugal-pump | ترومپای دەرکردنی چەقی، ترومپای باوەشێندار، لە هەندێك مەکینەدا بەکاردێت . |
| طلمبة الثدي ، شفاطة الثدي | Milk pump | مەمك مژە، ترومپای مەمك، مژۆکی شیر، شیرمژ. |
| طلم ، خشبة | | پنە، خوانە، فەرشە ، پنکەی نانکردن . |
| طُلمة، خبز رقاق | Thin bread | نانی تیری . |
| طلُوة، فجر | Dawn, Day-break | سپیدە، سپیدەی بەیانی . |
| طلوع | Rising | هەلآتن، دەرهاتن . |
| طلوع الشمس | Sunrise | ڕۆژهەلآتن، خۆرهەلآتن . |
| طلوع ، خراج | Abscess, Tumour | بلۆق، تلۆق، ئامێسك، زیپکە. |
| طلوقة، فحل الخيل | Stallion | ئەسپی پەڕین، ئەسپ لە تەمەنێکی تایبەتیدا کە پیر دەبێت . |
| طلي | Fawn | شەمکوڕ، بەچکە ئاسك. |
| طلي ، طلو ، طليان | Lamb | بەرخ، کار ، شەمزە، گیسك . |

| | | |
|---|---|---|
| طليق | | بروانه ( طلق) |
| طلي | Coating , Covering layer | رووکەش کردن، بۆیەکردن ، چەورکردن، ئاڵدوزکردن. |
| طلي بالمعادن | Coating with-mineral | رووکەش کردن بە کانزا یان مەعدەن. |
| طلي بالميناء | To enamel | رووکەش کردن بە مینا . |
| طلي بالذهب | To gild, Overlay with gold | زەرکەفت ، زەرکەش، ئاڵدوز، تەلاکردن، داپۆشینی کانزای هەرزان وەکو مس بە چینی تەنك لە زێر بۆ جوانی و پاراستنی لە هەواو شێ و مادە کیمیاییەکان . |
| طلي كهربائي | | بروانە ( طلاء كهربائي) |
| طليعة | Vangurad | پێشەنگ، پێشەوا، پێشڕەو. |
| طليحة ورق ، رزمة ورق | Ream of paper | بەستەکە کاغەز . |
| طلنيس ، دلنيس | Tellinus | ( تەلینەس) ، جۆرێکە لە گوێچکە ماسی لە لمی قەراغ ئاودا چەقیوە . |
| طليس ، الكمة ، اعمى خلقة | Inbornblind, Congenital-blind | کوێری زگماك . |
| طمارين | Tamarin | ( تامارین) ، جۆرە مەیمونێکی بچووکی کلك درێژە لە گیانداری مارمۆزیت دەچێت لە باشووری ئەمریکادا دەژی. |
| طمانية | Peacefulness | دڵنیایی. |
| طماق ، مسماة، طزلق، جرموث | Spats, Short-gaiters | نیوەجزمە، کاڵە، نیوە جزمەیەکە تەنها دەکرێتە لاقەوە . |
| طماطم، قوطة ، بندورة ، طماطة | Tomatoes | ( تەماتە) ، باینجانە فەرەنگی، جۆرە گیایەکی ساڵانەیە، بەرێکی خڕی گەورەی ترشی سووری هەیە بە کاڵی دەخورێت یان دەکرێت بە چێشت و یان دۆشاوی لێدەردەهێنرێت . |
| طمة | Smotheredfire | ژیلەمۆ ، ئاگری ژێر خۆڵەمێش |
| طمث، دم الحيض | Menses, Menstruation, Menorrhagia , Catamenia, Menstrual-blood | حەیز، خوێنی بێنوێژی . |
| طمث كاذب، حيض كاذب | Pseudo-menstruation | بێنوێژی درۆزنە، حەیزی درۆزنە. خوێن ڕژانی منداڵدان بە هۆی نەخۆشییەوە . |
| طمغ، عترب ، سماق عرنة | Hawthorn like- sumach , | جۆرێکە لە درەختی سماق بۆ دەباغکردن بەکار دێت. |
| طمر | Tatters | جلەکۆن . |
| طمر ، دفن | Burying, Embedding | ناشتن، داپۆشین لە ژێر زەویدا . |
| طمراق، صنوبر اسود | Tamark, Tamarack, Black pine | ( تاماراك) ، درەختێکە لە کۆمەڵەی سنەوبەرە ، سنەوبەری ڕەش . |
| طمروق | Plecotus | ( پلیکۆتەس) ، جۆرێکە لە شەمشەمە کوێرە . |
| طمس | Effacement, Obliteration | نقوم کردن، شاردنەوە ،بەژێرەوەکردن . |
| طمس ، طول البصر | Hyperopia | دووربینی ، لە دوورەوە بینین . |
| طمطام | Offing | ناوەڕاستی دەریا ، پانتایی دەریا . |
| طمع ، حب المال | Avarice | چاوبرسێتی ، چاوچنۆکی ، پوولەکێتی ، پارەپەرستن . |
| طمغة | Stamp | دامغە ، مۆر، تەمغە، شەقڵ، دەستەرە، شەخل، نیشانەکردنی خەرمان . |

| | | |
|---|---|---|
| طمل ، عجين | Paste, Dough | هەویر . |
| طملة ، حماة | Muddy water | قوڕاو. |
| طملال ، ذئب | Wolf | گورگ. |
| طملول | Thornless | ڕووەکی بێدڕك. |
| طُموح ، حُب الرفعة | Aspiration, ambition | ئارەزووی سەرکەوتن ، سەرکەوتن خوازی . |
| طموح ، طامع ، طماع | Aspirant, Ambitious | سەرکەوتن خوار، کەسێ: هەمیشە ئارەزووی سەرکەوتن و پێشکەوتن بکات . |
| طمي ، ابليز، غرين | Colluvium, Alluvium , Warp, Silt | قوڕو لیتە . |
| طميل ، قلادة | Neck lace | ملوانکە . |
| طنانة | Humble-bee, Bumblebee, Bombus | .زیکزیکە، ویزویزە، جۆرێکە لە مێروو لە هەنگ دەچێت ، تووکن و بریسکەدارە لە کاتی فڕیندا قنگە قنگی لێوە دێت . |
| طنان، طير طنان ، طائر ذبابي | Humming bird | وژەوژەکەرە، باڵندەیەکی بچووکە ڕەنگی پەڕی باڵەکەی لە پەلکەزێڕینە دەچێت، دەنووکی لە شێر ( شمشێر) دەچێت، لە کاتی فڕیندا وژەوژ دەکات. |
| طنان، رنان | Resounding, Ringing | ویزەویزکەر، زرنگەکەر، قنگەکەر . |
| طناب، طنب | Rope | تەناف، پەتێك یان گوریسێکی درێژ. |
| طنب، وتر العضلة | Tendon | ژێی ماسولکە . |
| طنبور ، طنبار ، جنك | Guitar, Harp | تەمورە، جۆرە ئامرازێکی موسیقایە لە کەمانچە دەچێت ملەکەی درێژە تەلێکی پێوەیە . |
| طنبور تركي ، برق، سنطور | Turkish harp | تەموورەی تورکی ، سەمتور ، ئامرازێکی مۆسیقایە . |
| طنبرجية | Thunbergia, Blackeyed-Susan | ( تەنبێرجیا) ، گیایەکە یان دەوەنێکی کەپرییە لە هیندیێ و وولاتی خۆرهەلات دەڕوێت ، گوڵی گەورەی بۆن خۆش دەگرێت، بە ڕەنگی زەرد یان پرتەقاڵی ، دەرمانی بەهێزکردنی لێدەردەهێنرێت . |
| طنب ، شجرة المخيط، اطباء الكلبة، سبستن | Sebesten-tree | بنبەر ، بنلبار، داری گوش، درەختی گوش، سبستان، داری دەمووکانە، گوانی سەگ . |
| طنبوشة المدخنة ، طربوشة المدخنة | Cowl, Mitreof-chimney | کلآوی دوکەڵکێش . |
| طنب ، فسيل | Shoot, Offshoot, Sprout | خەڵف، شەخەڵ. |
| طنبور | Xiphydria, Wood wasp | زەرموالەی تەختەخۆر، زەردەوالەیەکە تەختە دەخوات . |
| طنبر ، عربة قلابة | Tip-cart | گالیسکەی کەلآبە، عەرەبانەی دوو پێچکە بۆ گواستنەوەی شتومەك. |
| طنج، هوبر، طفل الغابة | Galago, Bushbaby | ( گالاگۆ) منداڵی دارستان ، جۆرێکە لە مەیموونی لیمورکلك و گوێی درێژە . |
| طنجرة، طنجير، طفت | Saucepan | مەنجەڵی مس، مەنجەڵی گەورە، قازان ، تیان، سوکرە ، ئەلبەکی ، پاتی ، پاتیلە. |
| طنجة | Tonga | ( تۆنگا) ، گالیسکەیەکی دووپێچکەیە ئەسپ ڕایدەکێشێت . |
| طنطنة، طنين | Tinkling , Tinnabulation | وشەوش، وژەوژ، قنگەقنگ . |
| طنطلة، غلصمة | | بڕوانە ( طلاطة) |
| طنغينة | Tang hinia | ( تانگینا) ، درەختێکی دەشتەکی و ڕازاندنەوەیە لە کۆمەڵەی ژاڵە بەرەکەی لە فنق دەچێت زەردی مەیلە و سوورە ، مادەیەکی ژەهرین لەبەر و قەدەکەی دەردەهێنرێت . |
| طنف | Porch-roof, Pent-roof | پاسار، کەپر، چەتری سەردەرگا ، سەلەندە ، گوێسەبانە، لوتکەی چیا. |

| | | |
|---|---|---|
| طُنفُ،بساط | Carpet, Rug | بەڕە، کلیم . |
| طنف، افريز السطح، جملون | Eaves, Gable | جەمەلۆن ، جۆرێکە لەسەربان پێشەکەی سێگۆشەیە، ئەملاوئەولاکەی لێژە. |
| طُن | Ton | چوارمەن، ( تەن ) هەزار کیلۆگرام . |
| طن انكليزي، طن متري، طن كبير | Metrication | تەنی ئینگلیزی ، ١٠٠٠ کیلۆگرام، ٢٢٤٠ پاوەند، تەنی مەتری . |
| طن امريكي، طن صغير | American ton | تەنی ئەمریکی ، ٢٠٠٠ پاوەند، ٢٠٠٠ ڕەتڵ . |
| طنين، رنين | Resounding , Ringing, Tinnitus, Tinkle | ڤنگەڤنگ، وژەوژ، ویزەویز، وزەوز، هاژەهاژ، سیڕەسیڕ، ڤنگە، زرنگانەوە . |
| طنين الاذن | Syrigmus, Tinnitus-aurium | وژەوژی گوێچکە، زرنگانەوەی گوێچکە . |
| طنين | Tone | ( تۆنـی ) ، ئـامرازێکی پـاکی دەنـگ وەکـو ئـەو ئـاوازەی کـە لـە چـەتاڵی زرنگانەوە دێتە دەرەوە . |
| طنين النحل و الذباب | Buzzing, Humming | ویزەویز، ڤنگەڤنگ . |
| طهاوة | Scum | توێژاڵ ، قەیماغ، قەتماغە ، بەڵغ . |
| طهاية ، طباخة | Cookery | پیشەی چێشت لێنان . |
| طهارة، طُهر | Cleanness, Purity, asepis | پاکی، تەمیزی، خاوێنی |
| طهارة ، طهور ، ختان | Circumcision | خەتەنە. |
| طهرُ، طهرة | | بڕوانە ( طهارة، طهر) |
| طهف | African millet grass | گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵودان لە هەرزن دەچێت بەرەکەی خڕ و بۆرە بۆ لەوەڕ بەکاردێت. |
| طهمل | Pimelopterus, Tahmel | ( تـاهمیل) ، ماسـی‌یەکی دەریـایی بێددانـە ، سمێڵـی زۆرە، هـەندێك لـە پەڕەکـەکانی و کلکـی لقـی درێـژی باریکیـان لێدەبێتـەوە لـە پەڕەسـێلکە دەچێت . |
| طهمل | Impalpable | هەست پێنەکراو، زۆر ورد . |
| طهوة ، طواية ، مقلاة | Skillet, Frying pan | تاوە، رندۆك، تاوەی خواردن سوورکردنەوە . |
| طهو | Cooking | چێشت لێنان . |
| طهي | | بڕوانە (طهو) . |
| طوارة، اقونيطن، بيش | Aconitum, Aconite | گورگ خنکێن، جۆرە گیایەکی ژەهرینە گوڵی جوان دەگرێت بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە بەکاردێت . |
| طواية | | بڕوانە ( طهوة، مقلاە) . |
| طوال الساق | Wading-birds | لاق درێژ، کۆمەڵە باڵندەیەکی لاق درێژن وەکو شینە شاهۆ و چێرگ. |
| طواد | Mountaineer | شاخەوان، ئەو کەسەی کە بە شاخدا هەڵدەگەڕێت . |
| طوالة، مربط الدابة، مذود | Stall, Manger | تەویلە ، ئاخوڕ، شوێنی حەوانەوەی ڕەشەوولاخ و ئاژەڵ. |
| طواف ، طوافة | Revolution | تەواف ، خولانەوە ، سوڕانەوە |
| طوالة | Stilts | دارشەق، قاچێك لە تەختەی درێژ دروست کرا بێت. |
| طوال الليل | All night long | شەوگار، بە درێژایی شەو . |
| طوال النهار | All day long | ڕۆژگار، ڕوجیار، بەدرێژایی ڕۆژگار . |
| طواف ، جوال | Ambulant | گەڕۆك، گەڕیدە. |
| طواف تجاري ، سمسار | Canvasser | دەلاڵ، دەلاڵی نێوانی بازرگان و کڕیار . |
| طواف البريد، ساعي البريد | Postman | پۆستەچی . |

| | | |
|---|---|---|
| طواب ، صانع الطوب | Brick maker | کورەچی، خشت دروستکەر . |
| طواشي ، خصي ، | Eunuch, Gelded, | خەساو، خەسێنراو. |
| طواشية | Castrated, Agenosomia | نەبوونی ئەندامی زاووزێ لە زیندەوەردا . |
| طُوب ، اجُر | | بڕوانە ( طابوق ) . |
| طوبة | Mill-ball | تۆپی ئاش ، تەمووی ئاش . |
| طوبالة، نعجة | Ewe | مەڕی مێ . |
| طوبى، فردوس | Paradise | بەهەشت . |
| طوبوغرافيا | Topography | ( تۆپۆگرافی ) ، باسکردن و وێنەگرتنی ڕووی زەوی ، هەروەها نواندنی بەرزونزمی ڕووی زەوی لەسەر نەخشە . |
| طوبجي، مدفعي | Gunner, Artillery-man | تۆپچی، ئەو کەسەی کە تۆپ دەتەقێنێ. |
| طوبجية، مدفعية | Ordnance, Artillary | تۆپچێتی ، هونەر و زانستی بەکارهێنانی تۆپ . |
| طوبال | Tupelo | ( تۆپیلۆ ) ، درەختێکی مەزنە لە باکووری ئەمریکا دەڕوێت . |
| طوبين، خلُد اوروبي | Mole ( Talpa) | مشکەکوێرەی ئەورووپی. |
| طوبة، اقسون، شكاعي، فحص الحمار، راس الشيخ | Wild artichoke, Cotton thistle | کەرتەشە کێویلە، کنگرە کێویلە ، گیایەکی پزیشکییە . |
| طوت، هجرت سبا، شادي | Grivet | ( گریڤیت)، مەیمونێکی بچووکی ڕەنگینی کلك درێژە. |
| طود، جبل طور | Mountain | کێو ، شاخ، چیا. |
| طور ، مرحلة | Phase, Limit, Stage, State, Condition | بار، دۆخ، شێوە تەرز، چۆنیەتی ، وار، وەکو دۆخی ڕەقی و شلی و گاز . |
| طور البلوغ | Adolescence | باری باڵق بوون، قۆناغی باڵق بوون . |
| طور مشيجي | Gametophyte | باری گەمێتی، قۆناغی گەمێتی ، بریتییە لە بەرەی ( وەچەی) زاووزێکردن ( زۆربوون) ڕەگەزیی لە ڕووەکدا. |
| طور متشتت، طور منتشر | Disperseed-phase | باری پەرشەوەبوو، وەکو لە مادە مڵەکاندا |
| طور بوغي | Sporophyte | باری سپۆریی، قۆناغی سپۆری بریتییە لە بەرەی ( وەچەی) زاووزێکردن ( زۆربوون) نارەگەزیی لە ڕووەکدا . |
| طور البلاستولا | Plastula-stage | باری پلاستۆلا، قۆناغی پلاستۆلا شێوەیەکە لە شێوەکانی کۆرپەلە لە هەنگاوەکانی گەشەکردنی سەرەتاییدا لە زۆربەی گیاندارەکاندا . |
| طور تمهيدي | Prophase | باری سەرەتایی، قۆناغی سەرەتایی هەنگاوی یەکەم لە هەنگاوەکانی دابەش بوونی ناڕاستەوخۆی خانەی زیندەوەر کرۆمۆسۆمەکانی تیا دەردەکەوێت و تەشی پەیدا دەبێت و پەردەی ناوکی دەتوێتەوە . |
| طور إستوائي | Metaphase | باری یەکسانی ، قۆناغی یەکسانی ، یەکێکە لە هەنگاوەکانی دابەش بوونی ناڕاستەوخۆی خانەی زیندەوەر لەتەکانی کرۆمۆسۆمەکان تیایدا لە ناوەڕاستی تەشییەکەدا ڕیز دەبن بەلەوەی کە جیاببنەوە و بەرو جەمسەری خانەکە بڕۆن. |
| طور إنفصالي | Anaphase | باری جیابوونەوە، قۆناغی جیابوونەوە ، یەکێکە لە هەنگاوەکانی دابەش بوونی ناڕاستەوخۆی خانەی زیندەوەر کەلەتەکانی کرۆمۆسۆمەکان لە یەکتری دوور دەکەونەوە و هەر لەتەی ڕوو دەکاتە یەکێك لە پۆڵەکانی (جەمسەرەکانی) خانەکە. |

| | | |
|---|---|---|
| طور نهائي ، طور اخير | Telophase | باری دوایی، قۆناغی کۆتایی، دواهەنگاوی دابەش بوونی ناڕاستەوخۆی خانەی زیندەوەر بریتی‌یە لە دابەش بوونی سایتۆپلازم و پەیدابوونی ناوکێك لە هەر یەکێك لە دوو خانە پەیدابووەکەدا . |
| طوربيد ، نساف | Torpedo | ( تۆربید) ، بۆمبای ئاوی، بۆمابیەکی لوولەکی‌یە، بە تەقەمەنی ئاخنراوە دەگیرێتە کەشتی ، کە بەر کەشتی‌یەکە دەکەوێت دەتەقێتەوە و کەشتی‌یەکە دەشکێنێت و نوقمی دەکات . |
| طوربيد | Torpedo | ( تۆرپیدۆ) ، جۆرە ماسی‌یەکی کرکرلگەدارە . |
| طوراني ، طوري | Geopelia | جۆرە کۆترێکە. |
| طوري ، طوراني | Wild | کێوی . |
| طورية ، فاس الزراعة | Hoe, Mattock | تەور، پاچەکۆڵە. |
| طورق | Touraco | ( تۆراکۆ) ، باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی واقواقە . |
| طوش | Castrated | خەساو، خەسێنراو، ئیختە . |
| طوط، صقر العصافير، علام، باشق | Sparrow hawk | هەڵۆی چۆلەکە، جۆرێکە لە هەڵۆ، واشەی چۆلەکە . |
| طوطي ، ببغاء | Parrot | ( تووتی) ، باڵندەیەکی رەنگینی دەنووك چەماوەیە ، چوار پەنجەی هەیە دووانی بۆ پێشەوە و دووانیبۆ دواوە ، توانای لاسایی کردنەوەی دەنگی هەیە. |
| طوطحة | To reel to and fro, Stagger | بەملاوبەولادا کەوتن وەکو سەرخۆش ، لالاەووکردن. |
| طوعي ، اداري | Voluntary | خۆویست ، کارێکی خۆویست. |
| طوفة | Tufa | ( توفا ) ، کەڤرێکی کلسی دەنکۆڵەداری کونکونە لە دەوروپشتی سەرچاوەکاندا دەنیشێت . |
| طوف ، طوفة | Hedge, fence | پەرژینی باخ . |
| طوف ، رومس، رمث | Raft, Float | کەڵەك، دەرفە، بریتی‌یە لە چەند کوندەیەکی فووداوو و بەستراون بە یەکتری‌یەوە بۆ مەبەستی گواستنەوە لە ئاودا . |
| طوف جليدي | Floe | کەڵەکی سەهۆڵی ، تۆپەڵە بەفری ( سەهۆڵی) گەورە کە سەر ئاو دەکەوێت . |
| طوفان | Flood, Deluge | لافاو، سیلاو. |
| طوق | Torchus, Collar necklace, Fret, Band | تەوق، کەڵەمە، تاسمە، ملوانکە ، یەخە، مادانگ، سەنجوور، ستۆیەن، قلێتە. |
| طوق المؤخرة | Breeching | ئەو بەشەیە لە زین کە دەوری باشووری وولاخ دەدات. |
| طوق المطبعة | Chase | تەوقێکی ئاسن لە چاپخانەدا بەکاردێت . |
| طوقان | Toucan | ( تۆکان) ، باڵندەیەکی ئەمریکی رەشە دەنووکی چەماوە و زلە و ئەستوور و پەمەیی‌یە . |
| طوقان | Tucana, Toucan | ( توکانا) کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشووری‌یە . |
| طوقيات | Monilia | تەوقدارەکان، ( مۆنیلیا) ، جۆرێکە لە ڕووەکی کەڕوو. |
| طوق الثوب، ياقة | Neck-band, Collar | یەخە، تەوق . |
| طوقريون، جعدة، ثوم الحية | Teucrium, Germander | سیرەمارانە ، ڕووەکێکی قەراغ ئاوە و تاڵە بۆ مەبەستی پزیشکی و کرم فرێدان بەکاردێت . |
| طوقريون مخزني، خامادريوس ، كمادريوس | Common germander, Groundoak, Wall germander | جیرەمانەر، گیایەکی پزیشکی تاڵە گوڵەکەی سوورە دەرمانی لێدەرهەمێنرێت بۆ چارەسەرکردنی کۆکە و سپڵ و کرم . |

| | | |
|---|---|---|
| طوقريون كوربي ، ماروم، صعتر الهر ، مرمار | Marum-germander, Cat thyme | جاترەی پشیله، گیایەکی دەشتەکی و ڕازاندنەوەیە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت . |
| طوك، ميس | Celtis, Nettle-tree | دارگەزندە، درەختێکە لە کۆمەڵەی دارە ڕەش بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە بەکاردێت، جۆرێکی هەیە بەرەکەی ڕەش و وردە و ڕەنگی زەرد لە توێکڵ و ڕەگەکەی دەردەهێنرێت تەختەکەی بۆ دروستکردنی کەلوپەل بەکاردێت. |
| طول ، خط الطول | Longitude | هێڵی درێژی، هێڵی درێژی ڕووی زەوی . |
| طول | Length | درێژی. |
| طول القامة | Stature, Height of body | درێژی بەژن، بەژن درێژی. |
| طول الموجة، الطول الموجي | Wave length | درێژی شەپۆل، ماوەی نێوان لووتکەی دوو شەپۆلی یەك لە دوای یەك . |
| طولي ، طولاني | Longitudinal | درێژایی، درێژی. |
| طول النظر، طول البصر، غرب العين | Hypermetropia | دووربینی ، درێژبینی ، بارێکی بینینە لە هەندێك کەسدا دەردەکەوێت بە زەرەبینی کۆکەرەوە چارەسەردەکرێت . |
| طول لابؤري ، بعد بؤري | Focal length | دووری، تیشکۆ، دووریی تیشکۆی زەرەبین . |
| طول ( قماش) | Bale ( of goods) | تۆپە قوماش . |
| طُول، ابو ساق | Stilt | پێ‌درێژە، لاق درێژە، باڵندەیەکی ناویی لاق درێژە. |
| طولوين ، تولوين | Toluene, Toluol | ( تۆلوین) ، ئاوێتەیەکی ئەندامییە لە کاربۆن و هایدرۆجین پێکهاتووە ، بریتییە لە شلەیەکی بێ‌ڕەنگی سوکەڵە لە خەڵوزی بەردینی تەمر دەردەهێنرێت لە پیشەسازی گەلێك مادەی کیمیاییدا بەکاردێت . |
| طول ، اقطيان | Water soldier | گیایەکە ڕەگەکەی سەلکدارە ، گوڵەکەی پەمەییە . |
| طولق | | بڕوانە ( طرية) . |
| طولوناتە، وسق، طن | Ton | تەن، تۆن، نزیکەی دووهەزار ڕەتڵ . |
| طومار | Roll, Scroll | تۆمار، ڕۆژنامە ، پارچە کاغەزێکی پێچراوەیە ، بڕوانامەی لەسەر نوسراوبێت . |
| طونة | Balsam herb | گیایەکە هەندێك جۆری دەخورێت و هەندێکی ڕەنگی زەردی لێ‌دەردەهێنرێت . |
| طون، تُن | Tuna, Tunny | ( تونا ) ، ماسییەکە لە جۆری سکۆمبەر ، پەرەکەی دڕکاوییە . |
| طونوغراف، تونوغراف | Tonograph | ( تۆنۆگراف)، پێوەری کرژبوونی خوێنبەری لەش . |
| طونومتر، تونومتر | Tonometer | ( تۆنۆمەتر) ، پێوەری کرژبوونی چاو یان پەستانی خوێن یان گاز یان هەڵم. |
| طووي، إنطوائي | Self-centered | کەسێك هەر گوێ بداتە خۆی و ئاگای لە کەسی تر نەبێت . |
| طووية، إنطوائية | Pilablenss | گوێدانەخۆ، گوێنەدانە کەسی تر . |
| طوي ، اشرة ، مرز | Ovipositor, Terebra | ئەندامی هێلکە چەقاندن ، ئەندامی چەقاندنی گەرا لە زەویدا لە لایەن هەندێك مێرووی وەکو کوللەوە . |
| طوي | To fold, Wrap up | قەدکردن ، پێچانەوە . |
| طويل | Long | درێژ. |
| طويل القامة | Tall | باڵابەرز، بە بەژن، کەڵەگەت. |
| طويل العمر | Long lived | تەمەن درێژ، بە تەمەن . |
| طويل اللسان | Foul-tongued | زمان درێژ. |
| طويل النفس | Long-Breathed | نوزە درێژ، هەناسە درێژ. |

| | | |
|---|---|---|
| طويل الراس | Dolicho cephlic | سەر درێژ، گیانداری سەر درێژ وەکو سەگ. |
| طويل الأرجل | Macropode | پێ‌درێژ. |
| طويل الساق | Grallator | قاچ درێژ، لاق درێژ. |
| طويل الذيل | Macrourous | کلك درێژ. |
| طويل المنقار | Long rosters | دەنوك درێژ. |
| طويقن | Toucanet | ( تۆکانیت)، جۆرە باڵندەیەکە . |
| طويل النظر، طامس | Hypermetropic, presbyopic | درێژبین، ئەو کەسەی لە دوورترەوە شت ببینێت . |
| طويل الرسغ | Long-pasterned | مەچەك درێژ. |
| طويل الريش، طويل الجناح | Longipennate | باڵ درێژ، پەڕ درێژ. |
| طويئفة | Subclass | ژێر پۆل، هۆزۆکە، پۆلۆکە، کۆمەڵێکی بچووك لە گیاندار . |
| طوينر، طير صغير | Birdie | تلور ، باڵندۆکە ، مەلۆکە، باڵندەیەکی بچووك. |
| طياب، ريح الشمال | North wind | بای باکوور. |
| طيار، قائد الطائرة | Aernaut, Ariafor , Aircraftsman, Pilot | فڕۆکەوان ( پیاو) . |
| طيارة، قائدة الطائرة | Bird woman | فڕۆکەوان ( ژن) . |
| طيارة، مركبة هوائية | Aeroplane | فڕۆکە . |
| طيارة ورقية ، راية شادن، طيارة الصبيان | Kite | کوڵارە، حەوایلە، فڕۆکەی کاغەز. |
| طيانة | Claying | قوڕەکاری ، نیشکردن بە قوڕ . |
| طيان | Hod man, Hod carrier | قوڕکار، گڵکار، کەسێکە قوڕەکاریی بکات . |
| طيار ، متبخر، مادة | Volatile | سووکەڵە ، هەڵچوو، هەر مادەیەکی کیمیایی کە زوو ببێت بە هەڵم لە پلەی گەرمی ئاساییدا وەکو ئیتەر . |
| طيب، عطر | Scent, Perfume | بۆنی خۆش ، عەتر . |
| طيب، جيد، حسن | Good | چاك ، باش |
| طيب ، معافى | Hale, In good health | چاك، لە نەخۆشی چاکەوە بوو. |
| طيب ، لذيذ | Pleasant, Delicious | خۆش، شتێك تامی خۆش بێت . |
| طيب القلب | Kind-hearted | دڵپاك. |
| طيب النفس | Good humoured | دەروون پاك. |
| طيبط، ابو طيط، طاتويت، زقزاق شامي | Lapwing, Peewit, green plover | زیقاوڵەی شامی، باڵندەیەکی لاق درێژە لە قەراغ ڕووبار و زۆنگاودا دەژی. |
| طيب الريح، بلسان، سمبوقة اقطي، بشامة، خمان | Elder, Sambucus | ( سامبوکەس) ، درەختێکە لقەکەی بریتی‌یە لە داری سیواك دەنکەکەی بۆ مەبەستی دەرمان و ڕازاندنەوە بەکاردێت . |
| طيب العرب، سنبل الطيب، اذخر، تبن مكة، حشيشة الليمون | Scenanth , lemongrass | کای مەککە، کای وشتر، گیایەکە گەڵا و گوڵەکەی بۆن خۆشە وەکو چای ، هەروەها بۆ مەبەستی پزیشکی و دروستکردنی عەتر بەکاردێت . |
| طية، ثنية | Fold | قەد، قات، نوشتاوی . |
| طية محدبة | Anticline | چینی قۆقز ، چینێکی قۆقز لە توێکڵی زەوی. |
| طية مقعرة | Syncline | چینی چاڵ، چینێکی چاڵ لە توێکڵی زەوی . |

| | | |
|---|---|---|
| طيثار | Midge, Tipula, Cranefly | ١. مێرووپەکی زیان بەخشە بە ڕووەك لە زەردەزیرە دەچێت بەڵام لەشی باریکە .<br>٢. جۆرێکە لە مێشوولە لاقی درێژە . |
| طير | Bird | باڵندە ، مەل، پەلەوەر ، پەرەوڵ، باڵندار ، فڕندە، پەلەوەر، بالافڕ، فڕۆك، پۆلێکە لە گیاندارە بڕبڕەدارەکان لەشی بە پەڕ داپۆشراوە ، دەنکو و باڵی هەیە، یەك کونی هەیە بۆ میز و پیسایی و زاووزێ ، مێیەکەی هێلکەکەرە . |
| طير حمامي، حماميات | Columbae, Charadifromes | باڵندە کۆترییەکان ، وەکو کوترە باریکە . |
| طير دجاجي- ( دجاجيات) | Galliformes | باڵندە مریشکییەکان، وەکو پۆڕ. |
| طير غواص | Diving bird | باڵندەی ژێر ئاو |
| طير القط | Cat bird , Cotton bird | پشیلەمەل، باڵندە پشیلە ، باڵندەیەکە خوێندنەکەی لە میاواندنی پشیلە دەچێت . |
| طير خياط، حباك، طير نساج | Tailor bird, Weaver bird, Oropendolas | گۆرەویلە، قوڵتە، قوشقە، باڵندەی بەرگدروو، باڵندەیەکە گەڵای درەخت بە ڕیشاڵ دەدورێت بەیەکەوە و هێلانەیان لێدروست دەکات ، شێوەی هێلانەکەی لە گۆرەوی دەچێت . |
| طير التعريش ، طير العريشة | Bower bird | باڵندەی کەپر، هێلانەکەی لە شێوەی کەپردا دروست دەکات . |
| طير الفأر | Mouse bird | باڵندەی مشك، مەلەمشکی، باڵندەیەکە ڕەنگەکەی خۆڵەمێشی یان قاوەیی مەیلە و شینە زیان بە کشتوکاڵ دەگەیەنێت . |
| طير المينة | Myna bird | باڵندەی (مینە)، باڵندەیەکی جوانە لە کۆمەڵەی ڕیشۆڵە توانای لاسایی کردنەوەی دەنگی مرۆڤ ، قسەکردن ، گۆرانی ، فیکە کێشانی هەیە . |
| طير طنن، طنان | Humming bird | باڵندەی وژەوژکەر، وژەورکەرە. |
| طير راض (رواض) | Cursores, Cursorial | باڵندەڕاکردووەکان، ئەو باڵندانەی کە قاچیان درێژ و باڵیان بێهێزە وەکو وشترمر، ناتوانن بفڕن هەر ڕادەکەن . |
| طير صداع ، صداحات | Warblers | باڵندە خۆش ئاوازەکان ، وەکو بولبول. |
| طير طويل الساق (طويلات الساق) | Gruiformes | باڵندە لاق درێژەکان، وەکو لەقلەق . |
| طير كفي القدم ( كفيات القدم) | Palmipedes | باڵندە پێ لەپییەکان، وەکو قاز و مراوی . |
| طير جاثم ( جواثم) | Passeriformes | باڵندە پاسارییەکان، باڵندە هەڵنیشتووەکان، وەکو چۆلەکە. |
| طير البقر | Beef eater, Cow bird, Cow bunting | مەلەمەنگا، جۆرە ڕیشۆڵەیەکە بەسەر پشتی مانگاوە دەنیشتێتەوە ، مێش و مەگەزی سەرپەرشتی دەخوات . |
| طير جارح، جوارح، طيور كاسرة | Bird of prey, Falconiformes, Raptores | باڵندەی دڕندە، باڵندەی گۆشتخۆر، باڵندەی ڕاوکەر ، وەکو هەڵۆ . |
| طير داجن ، طيور اهلية ، طيور داجنة | Fowls, Poultry | باڵندەی ماڵی، باڵندەی دانەخۆرە ، وەکو مریشك. |
| طير كاتب، طير الكاتب | Secrtary bird | باڵندەی نووسەر ، جۆرە باڵندەیەکی ئەفریقی گەورەیە ، گیانداری خشۆکی وەکو مار دەخوات ، بەرزییەکەی چوارپێ دەبێت ، تاجە پەڕێکی بەسەرەوەیە لە قلّچەی ( قەڵەمی ) نووسین دەچێت . |
| طير دوري | Sparrow | مەل ماڵی ، باڵندەی ماڵی، وەکو چۆلەکە. |
| طير ببغائي (ببغاوات) | Psittacula | باڵندە توتییەکان ، وەکو توتی . |

| | | |
|---|---|---|
| طير مهاجر ، قواطع | Migratory bird | باڵندەی رەوەند، وەکو حاجی لەقلەق . |
| طير متسلق (طيور متسلقة) | Scansores | باڵندە هەڵگەڕەکان، وەکو دارکونکەرە کە بە درەختدا هەڵدەگەڕێت . |
| طير مقيم | Raiser bird | باڵندەی نیشتەجێ ، ئەو باڵندەیەی کە تەنها لە یەک ناوچەدا دەژی و کۆچ ناکات . |
| طير خرافي ، رخ | Rukh, Roc | قەقنەس، باڵندەیەکی ئەفسانەیی‌یە. |
| طير النؤ | Petrel, Pentrel | باڵندەیەکی دەریایی بچووکی باڵ درێژە بۆ ماوەیەکی زۆر دەفرێت . |
| طير ثدي ، طير لبون | Mammal bird, Duckbill, Platypus | باڵندەی شیردەر، وەکو گیانداری دەنوکە مراوی، گیاندارێکی ئاوی مەمکداری هێلکەکەرە لە ئوستralیا دەژی ، دەنوکەکەی لە هی مراوی دەچێت . |
| طير افعواني، طائر الافعوان | Snake bird | باڵندە ماریی، باڵندەمار ، باڵندەیەکە ئاوییە ، دەنووک و ملی درێژ و باریکە وەکو مار ملی دەلەرێنێتەوە. |
| طير الحق، البوم الصياح، أم قويق | Screen owl | حەق حەقکەرە، شەو ئاوێز، جۆرێکە لە کوندەبەبوو . |
| طير الابابيل | | تەیرە ئەبابیلە ، کاردەپەلە، غازی ، پەڵەوانە. |
| طير فرقاطة | Frigate bird, Man of war bird | باڵندەی ( فریگێت)، باڵندەیەکی ڕەشە، توورەکەیەکی سووری لە ژێر ملی‌دا لە ناوچەی دەریا گەرمەکاندا دەژی ، باڵی باریکە بە ستوونی لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە بۆ ئەوەی پڕ بکات بە نێچیرەکەیدا . |
| طير التنام | Tinamou | ( تینامۆ) ، باڵندەیەکە لە باشووری ئەمریکادا دەژی ، لاقەکانی بەهێزن . |
| طير التوهي | Towhee | (تۆهی)، جۆرە باڵندەیەکە. |
| طير التدرج الآسيوي | Tragopan | ( تراگۆپان) ،پۆری ئاسیایی، جۆرە باڵندەیەکە . |
| طير الاخضير | Vireo | ( ڤیریۆ) ، باڵندەیەکی ئەمریکی ڕەنگ زەیتونی‌یە ، مێروو دەخوات. |
| طير الابلق ، ابو بليق | Wheatear | کاسەڵە، باڵندەیەکی بچووکی باڵ درێژی کلک خڕە لەسەر کرم دەژی . |
| طير النكات | Avoset, Avocet | ( ئەڤۆسیت)، باڵندەیەکی ئاوی لاق درێژە دەنوکی درێژ و چەماوەیە بۆ سەرەوە. |
| طير النقار | Flicker | دارکونکەرە، جۆرە باڵندەیەکە . |
| طيران طليق | Free flight | فڕینی سەربەست، فڕینی بەرەڵا، واتە فڕینی فڕۆکە یان ڕۆکێت (ساروخ) بە هێزی جووڵێنەر . |
| طيرية التلقيح | Ornithophilous | ئاوسکردنی باڵندەیی، ئاوسی باڵندە، ئەو ڕووەکانەی کە بە هۆی باڵندەوە گوڵەکانیان ئاوس دەبن، چونکە باڵندە هەڵاڵەیان لە ڕووەکەکانی ترەوە بۆ دەهێنن. |
| طيري | Ornithic | باڵندەیی، هەر شتێك پەیوەندی بە باڵندەوە هەبێت . |
| طير الطعم | Decoy bird | باڵندەی چەش، باڵندەی کچۆڵە ، باڵندەیەکی دەستکردە لە شوێنی تایبەتیدا دادەنرێت بۆ ئەوەی باڵندەی تری لێکۆببێتەوە و ڕاوبکرێن . |
| طير الشاطيء | Shore bird | باڵندەی قەراغ ئاو. |
| طير الارز | Ricebird, bobolink, Paddy-bird | باڵندەی برنج، جۆرە باڵندەیەکە لە مەرەزەدا دەژی و بە زۆری برنج دەخوات . |
| طير محاكي | Mocking bird | باڵندەی لاسایی، باڵندەیەکە توانای ئەوەی هەیە کە لاسایی دەنگی باڵندەکانی تر بکاتەوە . |
| طير ابو سمن | Adjutant | سەقاقوش، جۆرێکە لە باڵندەی لەقلەق ،. |
| طير التنبية | Alarm bird | باڵندەی وریاکردنەوە ، جۆرێکە لە زیقاوڵەی جقەدار. |
| طير النمل | Ant bird | باڵندەی مێرووله . |

| | | |
|---|---|---|
| طير الرسول | Apostle bird | بالندەی پەیامبەر ، بالندەیەکی ئاوچەوان سپی‌یە . |
| طير الموز | Banana-bird, Jamaica oriole, Bananaquit | بالندەی مۆز، جۆرێکە لە بالندەی فیکەکێش . |
| طير النباح | Barking bird | بالندەوەڕ ، بالندەیەکە خوێندنەکەی لە وەڕینی سەگ دەچێت . |
| طير الشعير | Barley bird | بـالندەی جـۆ، کۆمەڵـە بالندەیەکـە ، کلـك هەڵسـەنگێنە و عەینـە مـەل دەگرێتەوە . |
| طير الكميت، طير كستنائي | Bay-bird, Beach bird | بالندەیەکی ڕەنگ کەستانەیی‌یە . |
| طير الشرشور الأحمر | Bishop bird | ریشۆڵەی سوور . |
| طير الدرسة | Bunting | جۆرێکە لە چۆلەکە . |
| طير الدم، آكل العسل | Blood bird , Honyeater | هەنگوین خۆرە، بالندەیەکە . |
| طير عريف الملاحين، طير إستوائي | Boatswain bird,Tropic bird, Bosun bird | بالندەی شامەلەوان. |
| طير القشطة، دجاجة الماء البرازيلية | Cream bird, Barazilian coot | بالندەی قەیماغ ، قەل مراوی بەرازیلی . |
| طير النار | Fire bird | بالندەی ئاگر ، بالندەیەکی بچووکە، پەڕەکەی بریسکەدارە . |
| طير الحُب ، طير طيب ، غذاء طيب، ببغاء استرالية | Budgeigar, Good , Food, Love bird | بالندەی دڵداری، خۆراکە خۆشە ، بالندەخۆشـە ، جۆرێکـی بچووکـە لە تووتی لە ئوستراليا دەژی، ڕەنگەکەی سەوزە، سەری زەردە کلکی شینە، لە قەفەزدا لە مالأندا بەخێودەکرێت ،نێر و مێ‌یەکانیان زۆر ئالودەی یەکترن . |
| طير النهار، طير نهاري | Day bird | بالندەی ڕۆژەکی، ئەو بالندەیەی کە بە ڕۆژ دەگەڕێت. |
| طير ليلي | Fly by night | بالندەی شەوەکی ، ئەو بالندەیەی کەبە شەو دەگەڕێت |
| طير برونزي | Bronzy bird | سارە، سارەج، بالندەیەکە ڕەنگەکەی لەڕەنگی مس دەچێت . |
| طير إستوائي | Tropic bird | بـالندەی ئیسـتوائی ، بالندەیـەکی دەنـوك سـوورە لـە زەریـای هێمـن و ئەتلانتیکدا دەژی |
| طير قيثاري، طير القيثارة | Lyre bird | مەلەگیتاری ، مەلێکە لە تاووس دەچێت ، نێرەکـەی کلکەکـەی دەکاتـەوە وەکو گیتاری لێدەکات . |
| طير البوق، بواق ، يعجمي لجب | Trumpeter, Psophia | مەلە زوڕنـا، بالندەیـەکی گـەورەی لاق درێـژی سـەر زلـە ، ڕەنگەکـەی قاوەیی‌یـە بـە شـێوەی پـۆل لـە قـەراغی ڕووبـاری ئـەمازۆندا دەژی، خوێندنەکەی لە دەنگی زوڕنا دەچێت . |
| طير ازرق | Blue bird | بالندە شینە، بالندەیەکی خۆش ئاوازە لە باکووری ئەمریکادا دەژی . |
| طير مظلي | Umbrella bird | بالندە چەتری، بالندەیەکە پەڕەکەی سەری وەکو چەتر وایە بە ملیدا شۆڕ دەبێتەوە. |
| طير ناقوسي | Bell bird | مەلە زەنگی، بالندەیەکە خوێندنەکەی لە دەنگی زەنگۆڵە دەچێت . |
| طير اسمر، طير رعاش | Brown bird, trembler | بالندە لەرزۆك. |
| طير البوق، طير الاقطروس | Bugler bird tropical | بالندە زوڕنازەن، دەنگەکەی لە دەنگی زوڕنا دەچێت. |
| طير الجزار ، طير النهس، طير الصرد ، طير الدغناش | Butcher bird, Shrike | ( شرایك) ، بالندەی قەساب . |
| طير الزبدة ، طير المراح | Butter bird bobolink | بالندەی کەرە، بالندەیەکی ڕەوەندە، خوێندنەکەی خۆشە . |

| | | |
|---|---|---|
| طي القنسلوة ، طير الراهب | Capuchin bird | باڵندەی ڕەبەن، باڵندیە کڵاودار . |
| طير البلاذر | Cashew bird | باڵندەی کاشیۆ، لەسەر درەختی کاشیۆ دەژی . |
| طير القراز | Curassow | ( کیورسۆ ) ، باڵندەیەکە لە قەلەموون دەچێت . |
| طير صائد الذباب | Gnatcacher | مێشگر، جۆرە باڵندەیەکە. |
| طير الثرثار | Chitty bird, Sin bird | باڵندەی چەنەباز، باڵندەیەکە زۆر دەخوێنێت . |
| طير الزير | Cicada bird | باڵندەی زیکزیکە . |
| طير الكاكاو، طير القهوة | Cocoa bird, Coffee bird | باڵندەی کاکاو، باڵندەی قاوە. |
| طير جوز الهند | Coconut bird , Black-cowled oriole | باڵندەی گوێزی هیند، کڵاوێکی ڕەشی هەیە. |
| طير التابوت ، طير الحافر | Coffin bird, Mangrove cuckoo | باڵندەی تەرم. |
| طير الحنطة ، طير الذرة | Corn bird | باڵندەی گەنم، گەنم دەخوات . |
| طير العريف، شحرور جامايكا | Corporal bird, Jamaican black bird | ڕیشۆڵەی جامایکا. |
| طير البقر، ذعرة صفراء | Yellow wagtail, Cow bird | کلك هەڵسەنگێنەی زەرد، جۆرە باڵندەیەکە . |
| طير المسيح، يقنة | Jesus-bird, Jacana | ( جاکانا ) ، باڵندەی مەسیح، باڵندەی عیسا، باڵندەیەکی لاق درێژە لە دەوروبەری زەلکاو و زۆنگاوەکاندا دەژی . |
| طير السيدة | Lady bird | خاتوو باڵندە، باڵندە خاتوونە، خاڵخاڵۆکە. |
| طير الجراد ، زرزور ذو عرف | Locust bird, Watted starling | کوللە خۆر، ڕیشۆڵەی پۆپنەدار . |
| طير الضحك، قرلي، قاوند، طير الابلة | Laughing bird, Jackass bird, Kookaburra | باڵندەی پێکەنین ( کوکابوورا ) ، باڵندەیەکی ئاویی ئوستڕالیە هێندەی قەلەڕەشەکەیەك دەبێت ، خوێندنەکەی لە پێکەنین دەچێت . |
| طير الذرة | Maize bird | باڵندەی گەنمەشامی ، باڵندەیەکی ڕەشە باڵەکەی سوورە . |
| طير الانبج، طير المانجا | Mango bird | باڵندەی عەمبە، لەسەر درەختی عەمبە دەژی . |
| طير مايو | May bird , October bird | باڵندەی مایس، باڵندەیەکی کۆچکەرە، خوێندنەکەی خۆشە. |
| طير الرياضة، طير اللعب | Game bird | باڵندەی یاری ، ئەو باڵندەیەی کە بۆ یاری ڕاو دەکرێت . |
| طير الطوارق | Touracos, Turaco , Tauraco | ( تۆراکو ) ، باڵندەیەکی ئەفریقی گەورەیە و ڕەنگی سوور لە پەڕەکانی دەردەهێنرێت . |
| طير الإله | God bird , Cubanemerald | باڵندەی خودایی. |
| طير التناجر | Gold bird, Tanager | ( تاناجەر)، باڵندەی زێڕین، باڵندەیەکی ئەمریکی بچووکە. |
| طير العشب، زمار الرمل، طيطوي | Grass bird | باڵندەی گیا، زیقاوڵە . |
| طير الارض | Ground bird, Quail-thrush | باڵندەی زەوی، جۆرێکە لە باڵندەی بۆقژە. |
| طير العسل | Honey bird | باڵندەی هەنگوین . |
| طير القليحي الاحمر | Whinchat | باڵندەیەکی خۆش ئاوازە، ڕەنگەکەی سوورە . |
| طير مطوق | Ruffed bird | باڵندەی تەوقدار، باڵندەیەکە تەوقێکی پەڕ وا لە ژێر ملیدا ، |
| طير النيلة | Indigo bird | باڵندەی چویت . |

| | | |
|---|---|---|
| طير باوباو، طير جاك ، طير الباوباب | Paw paw bird, Jack bird | باڵندەی( پاوپاو) ، باڵندەی جاك. |
| طير ملك العصافير ، صياد الذباب | King bird, Tyrant-bird, Tyrant fly catcher | شاچۆلەکە، مێشگرە، شامەل، شاباڵندە، مێشگرەی ئەمریکیی گەورە . |
| طير الصدفة | Cowry bird | باڵندەی سەدەف . |
| طير لتاج، طير الإكليل | Crown bird | باڵندەی تاج، باڵندەی گوڵبەند. |
| طير الوقواق | Cuckoo bird | باڵندەی واقواق. |
| طير الموت، بومة الحبوب | Death Bird, Barn owl, jumbie bird | باڵندەی مردن، جۆرێکە لە کوندە ( کونگە) بەبوو، حەز بە خواردنی گەنم دەکات . |
| طير الماس | Diamond bird, Pardalote | باڵندەی ئەڵماس . |
| طير القرزبيل | Crossbill | باڵندەی دەنوك خاچی ، باڵندەیەکە دەنووکی لە خاچ دەچێت . |
| طير الدكتور، طير الطنان | Doctor bird, Humming bird | باڵندەی دوکتۆر ، باڵندەی وزەوزکەرە. |
| طير الكعك | Dough-bird | باڵندەی کێك، باڵندەی چۆرەك. |
| طير التين ، اكل التين | Fig bird, Fig-cater | باڵندەی هەنجیر خۆرە. |
| طير الحسون | Goldfinch, Flax bird | باڵندەی چۆلەکە زێرینە . |
| طير الفراشة، حميراء | Butterfly bird, red start | باڵندەی پەپوولە، مەلە پەپوولە، شێوەکەی لە شێوەی پەپوولە دەچێت . |
| طير الراهب | Friar bird | باڵندەی رەبەن، باڵندەی راهیب . |
| طير الدبق | Mistletoe bird | باڵندەی دەموکانە . |
| طير الودعة الصفراء، طير جوزة الطيب | Nutmeg bird, Cowry bird | باڵندەی سەدەق زەرد . |
| طير العداء | Courser | ( کەوەرسەر) ، باڵندەی خێرا راکەر، جۆرێکە لە زیقاوڵە. |
| طير الفرن، طير التنور، خرشنة الصفصاف | Oven bird, Willow tern | باڵندەی تەنور، هێلانەکەی لە شێوەی تەنوردا دروست دەکات . |
| طير الثور، طير الدريجة | Ox-bird, Dunlin | باڵندەی گا، باڵندەیەکی ئاوییە لە زیقاوڵە دەچێت . |
| طير النخيل، نساج القري | Palm bird, Village weaver | باڵندەی دارخورما، جۆرێکە لە باڵندەی قوڵتە. |
| طير المرزة، طير حقل الارز | Paddy Bird | باڵندەی مەرەزە، باڵندەی چەڵتوك. |
| طير المرعي ، طير الكلأ | Pasture-bird | باڵندەی لەوەرگە. |
| طير القس | Parson bird, Poe bird | باڵندەی قەشە. |
| طير مرشد | Pilot bird | باڵندەی رابەر . |
| طير البريد | Post bird, Spotted fly Catcher | باڵندەی بەرید، مێشگرەی کونج . |
| طير الأمير | Prince bird, Hooded tanager | باڵندەی میر ، میر باڵندە. |
| طير نافخ | Puff bird | باڵندەی فووکەرە، باڵندەی خۆپفکەرە. |
| طير القوس قزح، اكل النحل، وروار، خضيراء | Rainbow bird, Bee eater | کەندەسمە، باڵندەی پەلکەزێرینە، هەنگخۆرە، باڵندەیەکی دەنوك درێژە. |
| طير الكردينال | Red bird, Cardinal | باڵندەی ( کاردینالْ) ، باڵندەسوورە، باڵندەیەکی ئەمریکی خۆش ئاوازە. |

| | | |
|---|---|---|
| طير القصب، هازجة القصب ، دخلة السعادي | Reed bird, Sedge warbler | بالندەی قامیش ، ئەو بالندەیەی کە لە زەلکاوی قامیشەلأندا دەژی . |
| طير الرامي | Rifle bird | بالندەی تیرئەنداز. |
| طير الارز | Rice bird, Java sparrow | بالندەی برنج، چۆلەکەی جاوا . |
| طير الصخر، نمنمة دورية | Rock bird, House wren | بالندەی بەردەلأنی . |
| طير الدفة، بط وردي | Rudder bird, Ruddy duck | بالندەی سوکان، سوورە مراوی ، جۆرێکە لە مراوی. |
| طير سارة | Sarah bird, Tyrannid bird | بالندەی سارا. |
| طير الساتان، طير الاطلس | Satin bird, Satin bower bird | بالندەی ساتان، بالندەی ئاوریشم. |
| عصفور الجراد، طير السفانا | Savana bird , Grasshopper bird | بالندەی ( سافانا) ، چۆلەکەی کوللە ، کوللە خۆر . |
| طير فضي | Silver bird | بالندەی زیوی . |
| طير الثلج | Snow bird, Snow bunting | بالندەی بەفر . |
| طير نتن، هوتزن | Stink bird, Hoatzin | بالندەی بۆگەنە، ( هۆتزن) بالندەیەکە لە بەشی باکووری ئەمریکای باشوور لە زەلکاوەکاندا دەژی . |
| طير القش، طير الحشيش | Straw bird, Grass bird | بالندەی کا، بالندەی گیا . |
| طير الصيف ، طير وقواق | Summer bird, Cuckoo-shrike | بالندەی هاوینە، واقواق . |
| طير التمير ، طير التمرة، طير الشمس | Sun bird | بالندەی خۆر، بالندەیەکی جوانی خۆش ئاوازە . |
| طير الغروب | Sunset bird, Rusty-taild-fly catcher | بالندەی خۆرئاوابوون، مێشگرەی ژەنگار. |
| طير الموجة | Surf bird | بالندەی شەپۆل. |
| طير التانيا | Tannia bird | بالندەی ( تانیا) . |
| طير كنيسة جاوة، عصفور جاوة | Java temple bird , Javasparro | چۆلەکەی کەنیشتەی جاوا . |
| طير الشوك، حسون | Thistle bird , Gold finch | بالندەی درك، فیرنەگولەی زێرین . |
| طير مظلي ، طير المظلة | Umbrella bird | بالندەی چەتردار، بالندەیەکە پۆپنەکەی لە شێوەی چەتردایە . |
| طيطوي، زمار الرمل، ابو طيط، قطقاط ، زقزاق ، شرشق | Red shank, Sand piper, Gambet, Tringa | زیقاوڵە ، لاق سوورە، سوورە لاق ، ( تیتوو) :- ١. جۆرە بالندەیەکە پەرەکـەی لـە سـەرەوە قاوەیـیـە ، کلکـی سـپـیـیە و قاچی زەردە، دەنووکی درێژ و ڕەشە، لە تەنکاودا دەژی. ٢. چۆلەکەی لم، جۆرە چۆلەکەیەکە سنگ و دەنووکی سوورە . |
| طيطوي أخضر الساقين | Green shank | لاق سەوزە، سەوزەلاق، جۆرێکە لە زیقاوڵە ، لاقەکانی سەوزن . |
| طير وحيد القرن ، صياح مقرن | Unicorn bird, Horned Screamer | بالندەی یەکشاخە، بالندەیەکە لە باشووری ئەمریکا دژەی. |
| طير العربة، ذو المنقار الإسفيني | Waggon-bird, Wedge bill | بالندەی گالیسکە، دەنوك پوازی. |

| | | |
|---|---|---|
| طيرالحائط ، صائد الذباب المبقع | Wall-bird, Spotted fly catcher | بالندەی دیوار ، مێشگرەی کونج. |
| طير ابو لغد ، طير مغيب | Wattle-bird | باڵندەی غەبغەبدار، دوو زیادە گۆشت لە ژێر ملیەوە شۆڕ بۆتەوە ، جۆرێکە لە هەنگوین خۆرە . |
| طير السوط ، طير ارمل، هويد | Whip bird, | باڵندەی قەمچیدار . |
| | Widow bird, Whidah | باڵندەی بێوەژن، باڵندەیەکی ئەفریقاییە، هێلانەکەی دەچێنێت کلکی نێرەکەی درێژە. |
| طير الزيت | Gvacharo, Oil bird | باڵندەی ڕۆن، باڵندەیەکە لە ئەمریکا و هیندستان دەژی ، ڕۆنی چێشت لە بێچووەکانی دەردەهێنرێت چونکە لەسەر میوەی چەور بەخێویان دەکات. |
| طير التمساح، زقزاق | Crocodile-bird , | باڵندەی تیمساح، جۆرە باڵندەیەکە زەرووی سەر لەش و ناودەمی تیمساح دەخوات. |
| طير الجنة، طير الفردوس | Bird of paradise | باڵندەی بەهەشت، مەلی بەهەشت ، باڵندەیەکی سنگ تەختە توانای فڕینی نییە، پەڕەکانی زێڕینە کلکی وەکو باوەشێن دەکاتەوە لە زەریای هێمندا دەژی. |
| طير الفردوس | Apus | باڵندەی بەهەشت ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشوورییە. |
| طير صغير | Small bird | بڕوانە ( طوێشر) باڵندۆکە، مەلۆکە. |
| طير العراقيب | Roller | بڕوانە ( شقراق) . |
| طير بائد | Archaeornithes | باڵندەی قڕتێکەوتوو. |
| طيران | Aviation, Flight , Flying | فڕین، باڵگرتن، هەڵفڕین، گەشتی ئاسمانی . |
| طيران فضائي | Space fight | فڕین لە دەرەوەی کەشی ( ئەتمۆسفێری) زەویدا . |
| طيران شراعي | Aerodonetics | فڕینی بایەوانی. |
| طيران طليق | Free flight | فڕینی سەربەست ، فڕینی بەرەڵا، واتە فڕینی فڕۆکە یان ڕۆکێت ( صاروخ) بەبێ هێزی جووڵێنەر. |
| طيرة | Myripristis | ( مایرپریستیس) ، ماسییەکی دەریایی پەڕەکە دڕکاوییە . |
| طيش | Rashness | سەرپێلی، هەڵەشەیی، عەقڵ سووکی . |
| طيف | Spectre, Spectrum | شەبەنگ، بۆ نموونە شەبەنگی ڕووناکی، سپییە بە شێوەی چەپکە ڕەنگێك دەردەکەوێت وەکو سوور و پرتەقاڵی و زەرد و سەوز و بنەوشەیی |
| طيف الاشعة السينية | X-Ray spectrum | شەبەنگی تیشکی ئێکس . |
| طيف الامتصاص | Absorption-spectrum | شەبەنگی مژین، جۆرە شەبەنگێکە هێڵ و شریتی ڕەشی تیایە، بریتییە لە شەبەنگی سپی کە بەناو مادەیەکدا تێپەڕ بووە و ئەو مادەیە هەندێك لە شەپۆلەکانی ڕووناکییەکەی مژیوە و لە شوێنی ئەوە چەند هێڵێك یان شریتێك دەرکەوتووە بە هۆی ئەم شەبەنگەوە جۆری مادەکە دەزانرێت . |
| طيف ذري | Atomic spectrum | شەبەنگی گەردیلەیی، شەبەنگی ئەتۆمی . |
| طيف خطي | Line spectrum | شەبەنگی هێلی، شەبەنگێکە بریتییە لە چەند هێلێکی جیا ئەوەك هێڵی پێکەوە نووساو . |
| طيفي | Spectral | شەبەنگیی، هەر شتێك پەیوەندی بە شەبەنگەوە هەبێت. |
| طيف الكتلة | Mass-spectrum | شەبەنگی بارستە، ئەو شەبەنگەی کە هاوتا جیاوازەکانی توخمێك پیشان دەدات. |
| طيف اولي | Primary spectrum | شەبەنگی سەرەتایی. |

| | | |
|---|---|---|
| طيف الشمس، طيف النور | Spectrum, Solar spectrum | شەبەنگ، وێنەیەکی بینراوە وەکو پەلکە زێڕینە، کاتی تێپەڕبوونی ڕووناکی سپی ( ڕووناکی خۆر) بە ئاوێزە ( سێ پاڵە) دا و شیبوونەوەی بۆ چەند ڕەنگێکی ساکار، بەم جۆرە سوور، پرتەقاڵی، زەردسەوزی، شین، چویتی ، بنەوشەیی و ئەگەر ڕوناکییەکە لە گازێکدا بوو ئەوا شەبەنگەکە بریتی‌ی دەبێت لە چەند هێلێك بەجێ‌و شوێنی هێڵەکانیدا سروشتی گازەکە ئەدۆزیتەوە . |
| طيف مستمر | Continuos-spectrum | شەبەنگی بەردەوام،شەبەنگێکە لە مادەی تیشکدەرەوە لە باری خەستیدا یان ئەتۆمی ئایۆناوی یان هەڵوەشانی ئەتۆمی ئازاد یان لە گەردەوە پەیدا دەبێت. |
| طيف إشعاعي | Radio spectrum | شەبەنگی تیشکی ، شەبەنگی رادیۆی . |
| طيف متقطع | Discontinuos-spectrum | شەبەنگی پچڕ پچڕ . |
| طيف شريطي | Band spectrum | شەبەنگی شریتی، شەبەنگێکە ناوچە ڕووناکەکانی لە شەبەنگی دانەوەدا (دەرپەڕیندا) و ناوچە تاریکەکانی لە شەبەنگی هەڵمژیندا بە شێوەیەکی پان دەبێت ، وەکو شریت نەوەك بە شێوەی هێڵی باریك. |
| طيف الانبعاث | Emission-spectrum | شەبەنگی دەرپەڕین، ئەو شەبەنگی ڕووناکی‌یەی کە ڕاستەوخۆ لەسەرچاوەیەکی ڕووناکی‌یەوە دەردەپەڕێت . |
| طيف كهرومغناطيسي | Electromagnetic spectrum | شەبەنگی ئەلیکترۆماگنێیك، شەبەنگی کارۆموگناتیسی . |
| طيف الظل | Umbra-spectrum | شەبەنگی سێبەر. |
| طيف مرئي | Visible spectrum | شەبەنگی بینراو . |
| طيفون | Typhoon | ( تایفوون) ، جۆرێکە لە گێژەڵووکە، لە ناوچەی خۆرئاوای زەریای هێمندا هەڵ دەکات . |
| طيلسان، جبة ، ثوب اخضر | Green robe, Pallium, Persian toga | پۆشاکی سەوز، عەبای سەوز، جبە ، کەوا . |
| طيم، عود الخير، بهشية الدبق، شرابة الراعي | Holly tree, Common holly | داری دەموکانە، دار و دەوەنێکە تەختەکەی بە نرخە توێکڵەکەی بۆ دروست کردنی دەموکانە بەکاردێت ، گەڵاکەی لە گەڵای داری بەڕو دەچێت |
| طين، صلصال، غضار | Clay, Argil | قوڕ، هەڕی، نەقن، چلپاو، لەرزگ، خەرگ، هەرگ. |
| طين، وحل، غرين | Slime, Mud | قوڕولیتە، لیتە. |
| طين ارمني ، انجبار الفخارين | Armenian bole, Bole | گڵەئەرمەنی ، بۆ پاککردنەوەی ددانەکان بەکاردەهێنرێت . |
| طين إصطناعي ، طين صناعي | Plasticine | قوڕەچەوره، مادەیەکی پلاستیکی‌یە لە قوڕ دەچێت منداڵان بۆ یاری شتومەکی لێدروست دەکەن . |
| طين الأشغال | Modelling clay | قوڕەچەوره . |
| طين الصين، كاؤلين ، طفل صيني ، طين ابيض | China clay, Kaolin | قوڕی چین، کائولین، گڵەسپی، سپلك، ئاخە سپیك، خۆڵێکی سپی‌یە لە ووردبوونی مادەی فیلدسپار پەیدا دەبێت لە دروستکردنی فەخفوریدا بەکاردێت، هەروەها ئاومالی پێ تەڕاو دەکرێت ( گڵ کەچکردن). |
| طيّ، ثني | Folding | دانوشتاندن، قەدکردن، پێچانەوە، قەمچکردن. |
| طي، لوي | To fold, warp up | نوشتاندنەوە ، قەد کردن. |
| طين خضار | Marl | مارڵ جۆرە قوڕێکە قسلی زۆر تیایە . |

| | | |
|---|---|---|
| طين خزفي | Bole, Clay , Porcelain-clay | قوڕی فەخفوری ، قوڕێکی سفتی مەیلە و سوورە بۆ زۆر کەفتکردنی لێواری فەخفوری بەکاردێت، ئەو قوڕەی فەخفوریی لێ دروست دەکرێت . |
| طين ناري | Fire clay | قوڕی ئاگرین، قوڕی ئەسوانی ، قوڕەسووتاو، جۆرە قوڕێکە ڕێژەیەکی زۆری لە ئەلۆمینا و سلیکای تیادایە. |
| طين اصفر | Yellow mud | سیم گڵ، گڵی زەرد |
| طين اسواني | | بڕوانە ( طين ناري ) |
| طين صفحي | Shale | تەمۆخ، بەردە تاوێر، جۆرە بەردێکە لە وردیلەی قوڕ و لیتە پەیدابووە، توێژاڵی لێدەبێتەوە |
| طين وجص، ملاط، مونة، طين لدن | Mortar , Plaster, Ball clay | ناوکار، دۆخاو، پالأنجە، قوڕوقسڵ، بۆ ناواخنی بەرد و خشت لە دیواردا |
| طين ماص | Absorbent-clay | (پیلۆن) ، قوڕی مژۆك، جۆرە قوڕێکی مژۆکە بۆ تیمارکردنی برین بەکاردەهێنرێ. |
| طين الكور | Ball | قوڕێکی زۆر جیڕە لە دروستکردنی سیرامیکدا بەکاردێت . |
| طين خاوة ، طفل صلصالي | Bentonite, Bentonite mud | گڵەسەر، قوڕێکی (گڵێکی) نایابە، ڕەنگی سپی‌یە ، لە ڕەوشتدا لە قوڕی سفتکەرەوە دەچێت ، لە ئەنجامی وورد و خاش بوونی شووشەی بورکانی لە ژێر ئاودا پەیدا دەبێت ، بریتی‌یە لە سلیکاتی ئەلەمنیۆمی ئاوی ، لە هەندێك شوێن سەری پێدەشۆن بۆ قژ خاوکردنەوە و لەشی پێدەشۆن بۆ نەهێشتنی خورو لە دروستکردنی کاغەزو گریسدا بەکاردێت . |
| طين اخضر | Green mud | قوڕەسەوز، قوڕێکی نیشتووی دەریای‌یە، بڕێك لە کانزای کلوکونایتی (سلیکاتی ئاسن و پۆتاسیۆم) تیادایە کە دەبێتە هۆی ڕەنگە سەوزەکەی |
| طين ازرق | Blue mud | قوڕەشین، قوڕێکی نیشتووی شینە لە بنی زەریاکاندا هەیە، گەلێك مادەی ئەندامی ڕزیو و گۆگرداتی ئاسنی تیادایە . |
| طين احمر، مغرة حمراء | Ruddle, Red mud | قوڕە سوورە . |
| طين غرواني | Colloidal clay | قوڕی مڵ . |
| طين قصار | | قوڕی سفتکەرەوە، جۆرە قوڕێکە بۆ سفتکردنەوەی چنراوی خوری یان لابردنی پەڵەی چەوری لەو خوری‌یە بەکاردێت . |
| طين اسود | Black mud | زەل، قوڕێکی ڕەشە بۆ ڕەنگ کردنی بەن بەکاردەهێنرێ . |
| طيون | | بڕوانە ( طباق ) ( راسن دبق) . |
| طيور اهلية ، طيور داجنة | Poultry, Fowls | باڵندەی ماڵی، پەلەوەر، پەرەوڵ . |
| طيور كاسرة ، طيور جارحة | Accipitres | باڵندە دڕندەکان، باڵندە گۆشت خۆرەکان، وەکو باز و هەڵۆ . |
| طيهوج، قطاة | Tetranoid, Sand grouse, See-see | تەیهوو، قەتێ، باڵندەیەکی بچووکە لە کۆمەڵەی مریشك هێلی زەرد و قاوەیی پێوەیە . |
| طيهوج اسود | Black-grouse | قەتێی ڕەش، ڕەشەقەتێ، باڵندەیەکی جوانە لەناو درەختی سنەوبەردا دەژی ، کلکی نێرەکەی لە کلکی ماسی دەچێت ، لە هەندێك شوێن پی‌ی دەووترێت کەڵەشێرە کێوی . |
| طيهوج احمر | Red grouse | سورەباڵە، قەتێ سوورە، باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی قەتێ‌یە . |
| طيهوج ازرق | Blue grouse, Dusky grose, Sooty grouse | شینەباڵە، قەتێ شینە، قەتێی خۆڵەمێشی . |
| طهيوج الصفصاف | Willow grouse | قەتێی بی، لەسەر داری بی دەژی . |

| | | |
|---|---|---|
| طيهوج الفندق | Hazel grouse | قەتێی فنق ، لەسەر داری فنق دەژی . |
| طيهوج كبير ، طهيوج الشجر ، خريس ، ديك الخلج ، دجاج البراري | Great grouse, Wood grouse, Caper caillie, Sand partridge | تەیهووی مەزن، قەتێی مەزن ، مریشکە کێوی ، جۆرێکی گەورەیە لە قەتێ، باڵندەیەکی گەورەیە دەنووکەکەی ئەستوورە لەناوچیاکاندا دەژی هەندێکی کلکەکەی لە گیتار دەچێت ، ڕەنگی شین و زەردی هەیە . |
| طيهوج متغير اللون ، طهيوج ابيض | White grouse | قەتێی سپی، ڕەنگەکەی بە پێی وەرز و شوێن دەگۆڕێت بۆ نموونە لەناو بەفردا ڕەنگەکە سپی دەبێت . |

| | | |
|---|---|---|
| ظئر، مُرضعة | Wet-nurse | دایەن ، ئەو ئافرەتەی کە بە کرێ شیر دەدات بە منداڵی ژنێکی تر . |
| ظالم ، صفنج | Chaffinch | چۆلەکەی خۆش ئاواز، باڵندەیەکی دەنگ خۆشە لە چۆلەکە دەچێت . |
| ظئرة، دعامة | Support, Prop, Stay | پایە، پایەی پاڵپشتی دیواری خانوو. |
| ظئرة | Rust | جۆرە کەڕوویەکی زیان بەخشە لە میوەجاتی وەکو هەڵوژە دەدات . |
| ظاهري ، خارجي | Ect- , Exo- | پێشگرێکە بە مانای( دیار، دەرەکی ) . |
| ظاهري ، خارجي | External | دەرەوەیی، دەرەکی . |
| ظاهر، واضح | Vissible, Apparent , Phanerous | دیار، ئاشکرا، دەرکەوتوو، ڕوون، ڕوزاو، خویا . |
| ظاهرة | Phenomenon | دیاردە، ڕووداو، دەرکەوتوو. |
| ظاهرة مرجانية، سراب مرجانا | Fate morgana, Mirage | بڕوانە ( سراب) . |
| ظاهرة موسباور | Mossbauer effect | دیاردەی مۆسباور ، ئەو تیشکەی کە لە ناوکی گەردیلەی هەندێک لە تەنە ڕەقەکانەوە دەردەپەڕێت لەرەلەرەکەی ( ترەد) بە باشی دەست نیشان دەکرێت. |
| ظاهرة جول | Joule effect | دیاردەی جول، گەرم بوونی مادەی گەێنەر لە ئەنجامی تێپەڕبوونی تەوژمی کارەبایی پیایدا . |
| ظاهرة کهربائية – حرارية، ظاهرة سيبك | Thermo-electric effect , Seebeck-effect | دیاردەی ( سیبیك)، دیاردەی پەیدابوونی هێزێکی پاڵنەری کارەبایی لە ئەنجامی بوونی جیاوازی لە پلەی گەرمی نێوانی دوو خاڵی بەیەکەوە نووسانی دوو کانزای جیاواز لە بازنەیەکی کارەباییدا . |
| ظاهرة طومسن | Thomson effect | دیاردەی تۆمسن:<br>١. پەیدابوونی هێزێکی کارەبایی لە ئەنجامی بوونی جیاوازی لە نێوان پلەی گەرمی نێوان دوو بەش لە هەمان گەیەندەری کارەباییدا.<br>٢. دەرپەڕینی یان هەڵمژینی گەرمی کاتێك کە تەوژمێکی کارەبایی لە بەشێکی گەرمەوە دەچێت بۆ بەشێکی سارد لە هەمان کانزادا . |
| ظاهرة يان تلر | Jahn-Teller-effect | دیاردەی ( یان تیلەر) دیاردەیەکە دەربارەی پێکهاتنی ئاوێنە . |
| ظاهرة فولتا | Volta effect | دیاردەی ڤۆڵتا ،ئەگەر دوو کانزای جیاواز لە هەوادا بەریەك بکەون ئەوا یەکێکیان ئەرکێکی زیاتر وەردەگرێت وەك لەویتر . |
| ظاهرة کهروضوئية | Photo-electric-effect | دیاردەی کارۆڕووناکی ، هەر گۆڕانێك کە لە ڕەوشتی کارەبایی تەنێکدا ڕوودەدات لە ئەنجامی بەرکەوتنی ڕووناکییەوە بێت وەکو پەیدا بوونی هێزی پاڵنەری کارەبایی یان گۆڕان لەبەر هەڵستی تەنەکەدا یان وونکردنی بارگە. |
| ظاهرة کومبتون | Compton effect | دیاردەی کۆمپتۆن، کاتێك کە تیشکی ( ئێکس) بەر ڕووی ئەو مادەیە بکەوێت کە کێشی گەردیلەییەکەی کەمە، ئەوا درێژی شەپۆلی تیشکە پەرشەوە بووەکان لە درێژی شەپۆلی تیشکە بەرکەوتووەکان زۆرتر دەبێت. |
| ظاهرة جوية (ظواهر جوية) | Meteor, Atmospheric phenomenon | دیاردەی کەشی، دیاردەی ئەتمۆسفێری وەکو هەور و باران و ڕەشەبا و هەورەتریشقە و هتد. |
| ظاهرة سلبية | Passive state | دیاردەی سەلبێتی، ڕەوشتێکە هەندێك کانزا پەیدای دەکات ، ئەگەر بەرترشی نیتریك بکەوێت توانای کارلێکی نامێنێت وەکو لە ئاسندا ڕوودەدات . |
| ظاهرة کوريوليس | Coriolis-effect | دیاردەی ( کۆریۆلیس) ،لادانی بارستەیەکی جووڵاوە لە ڕێبازی خۆی لە ئەنجامی سوڕانەوەی خرۆکی زەوییەوە . |

| | | |
|---|---|---|
| ظاهرة دوبلر | Doppler effect | دیاردەی ( دۆپلەر)، کەمی یان زۆریی لەرینەوەی شەپۆلی دەنگ یان ڕووناکی بە هۆی جوولەیەکی ڕێژەیی لە نێوان سەرچاوەی شەپۆلەکان و سەیرکەرەکەدا . |
| ظاهرة خداع البصر | Stroboscopic-effect | ڕێشکە و پێشکەی چاو، وەکو ئەوەی کە سەیری تەنێکی جۆلاوە بکەین وابزانین کە وەستاوە . |
| ظاهرة طبيعية | Natural phenomenon | دیاردەی سروشتی، ڕووداوێکی سروشتی. |
| ظاهرة اولنبك و كودشمت | Uhlenbeck and Goudsmids effect | دیاردەی ( ئۆلینبیك و گۆد شمیت) بوونی هەندێك هێڵی شەبەنگی جووت لە شەبەنگی کانزا ئەلکالییەکاندا . |
| ظاهرة كيمياوية | Chimical effect | دیاردەی کیمیاگەریی، ڕووداوێکی کیمیایی وەکو ژەنگ هەڵهێنان . |
| ظاهرة زيمان | Zeeman effect | دیاردەی ( زیمان) ، دیاردەی کاری موگناتیسی بەهێز بەسەر هێڵی شەبەنگدا. |
| ظاهرة اديسون | Edison effect | دیاردەی ( ئەدیسۆن)، دەرپەڕینی ئەلیکترۆن لە تەلێکی باریکی داگیرساوەوە کە تەوژمی کارەبایی پیادا بڕوات . |
| ظاهرة تندال، ظاهرة تندل | Tyndall effect | دیاردەی ( تینداڵ ) ، پەرتبوونی چەپکێك لە ڕووناکی کاتێك کە بە ماددەیەکی ڕووندا تێپەڕ دەبێت. |
| ظبطة، سنط عسلي | Acacia mellifera | ئەکاکی هەنگوینی ، درەختێکە لە چیاکانی دوورگەی عەرەبیدا دەڕوێت . |
| ظبي | Buck, Antelope, Deer, Gazelle | ئاسك، ئاهو، مامز، جەیران، وەرەماس . |
| ظبي . ذكر الغزال | Buck, malesdeer | ئاسکی نێر. |
| ظبية، انثى الغزال، ام الخشف، ام شادن، ام الطلا | Doe, Roe, Hind | ئاسکی مێ . |
| ظبية ، حياء ذي الحافر | Vagina of solipeds | شەرمگەی گیاندارە سمدارەکان . |
| ظبي شوسنجة | Fourhorned-antelope, Chousinge | ئاسکی ( شۆسنجە) ، جۆرێکە لە ئاسك لە هیندستان دەژی . |
| ظبي اسود، غفر، ظبي هندي ، تيل | Cervicapr, Black buck, Sable antelope | ئاسکی ڕەش . |
| ظبي هيرولة، بقرة عيناء | Hunters-antelope | ئاسکی ڕاوچییەکان، ئاسکی ڕاو . |
| ظبي الماء | Water-buck | ئاسکی ئاویی. |
| ظبي هوش | Decula antelope | ئاسکی ( هوش) ، ئاسکی دیکۆلا . |
| ظبي عربي ، اعفر | Gazelle Arabica | ئاسکی عەرەبی . |
| ظبي اغبر ، ظبي احمر ، ظبي ابو عرف | Roan antelope | ئاسکی سوور، ئاسکی باڵدار . |
| ظبي هندي | Indian antelope | ئاسکی هیندی . |
| ظبي بونغو مروا، ظبي بنغانا | Bongo antelope, | ئاسکی بۆنگۆ، ئاسکی ئیسحاق . |
| ظبي القصب | Reed buck | ئاسکی قامیشەڵان . |
| ظبي كوب | Kob antelope | ئاسکی کۆب، ئاسکێکە پەلەکانی کورتن . |
| ظبي ازرق ، هليم | Cephalophus | ئاسکی شین . |
| ظبي التبت | Goa | ( گوا) ، ئاسکی تیبت، جۆرە ئاسکێکە کلکەکەی ڕەشە لە وڵاتی تیبتدا دەژی. |

| | | |
|---|---|---|
| ظران، فلنت، ظر، ظُررة | Flint, Silex | ( فلينت ) ، بەردە ئەستێ، جۆرێکە لە مەعدەنی کوارتز، بەردێکی پتەوە . |
| ظربان ، ظرباء، ابو عفن ، ابو المنتن ، ابن مقرض ، فار الخيل | Ictonyx, Ferret, Polecat | بۆگەنکە، گیانداڕێکی شیرەدەری گۆشت خۆرە ، مشك و مار و مارمێلکە دەخوات ، هێندەی پشیلەیەك دەبێت ، لە دەڵەك دەچێت ڕەنگەکەی قاوەیی یان بۆری مەیلەو ڕەشە، ژێر سکی سپییە پێستەکەی بە نرخە ، چاوی تیژە ، تورەکەکەیەکی هەیە بە بنی کلکییەوە ، شلەیەکی بۆگەنی تێدا کۆدەبێتەوە دەیگرێتە دوژمن لە کاتی ترسدا یان بۆ پاراستنی خۆی . |
| ظربان امريكي، ظربل | Shunk, Mephitis | بۆگەنکەی ئەمریکی . |
| ظربان افريقي ، زورلة، ظربان مخطط | Zoril, Zorilla, Straied weasel, Striped shunk | ( زۆریل ) ، بۆگەنکەی ئەفریقی ، بۆگەنکەی هێڵدار، جۆرێکە لە بۆگەنکە هێڵی ڕەش و قاوەیی و زەردی پێوەیە . |
| ظرف ، حالة | Circumstance | بار، دۆخ. |
| ظرف، خرطوشة | Cartidge | فیشەك. |
| ظرف ، غلاف | Envelope, Cover | زەرف، کیسەی کاغەز . |
| ظرو اسود، بكف، حبة القلب، نوفة، فوانيس | Balloon-vine, Heart-pea, Love in a puff | دەنکی دڵ، قەزوانی ڕەش، ڕووەکێکە گوڵەکەی سپییە ، دەنکەکەی هێندەی نوکێك دەبێت ڕەش و ڕەقە . |
| ظروف قياسية، ظروف عيارية | Standard-conditions | بارە پێوانەییەکان ، ئەو بارەی کە تیایدا پلەی گەرمی سفری پەتییە و پەستان (٧٦٠) ملیمەترە . |
| ظروف إعتيادية | Ordinary-conditions , Usual conditions | بارە ئاساییەکان . |
| ظريف | Prettiness | زیرەك و قۆشمە ، قسەخۆش . |
| ظريفة اوقارديون | Eucaridium | ( ئیوکاریدیوم) ، ڕووەکێکە گوڵی جوان دەگرێت . |
| ظربل | | بڕوانە ( ظربان امريكي) . |
| ظعن ، ظعينة | Furniture, Luggage | کۆچ و بار. |
| ظعون، بعير | Dromedary of burden | وشتری بار . |
| ظفر ، جدل | Interlacing | هۆنینەوە، وەکو هۆنینەوەی پرچ . |
| ظفر ، اظفور | Nail, Finger-nail, Claw, Unguis | نینۆك، چرنووك، ناخوون، نینك. |
| ظفرة | Pterygium | تانەی چاو، تەمی سەرچاو ، پەیدابوونی پەردەیەکی تەنکی سپی ڕەق لەسەر وشکێنە ( قرنية) یان ڕەشێنەی چاو، کە ڕێگە لە بینین دەگرێت واتە کوێری دەکات . |
| ظفري | Onych, Onycho | نینۆکیی، پێشگرێکە پەیوەندی هەیەبە نینۆکەوە . |
| ظفراء، نعناع بري ، ظفيرة | Wild mint | نەعنا کێویلە، گیایەکە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت . |
| ظلام | Darkness | تاریکی ، تاریکایی، شەوەزەنگ، نووتەکی . |
| ظلامي | luci fugous | تاریکی خواز، ئەو گیاندارەی کە حەز بە تاریکی بکات و خۆی لە ڕووناکی دوور بخاتەوە وەکو هەندێك مێروو و باڵندە . |
| ظلامية، خنفساء الدقيق | Meal worm-beetle | قالۆنچەی ئارد، ئەسپێی ئارد . |
| ظُلاع | Ostreoar thirtis, Ostear thritis | ١. ئازاری ئێسك و جومگە، ئاوسانی ئێسك و جومگە لە ئەنجامی ڕۆماتیزمەوە.<br>٢. ئازارێکە لە قاچی ئاژەڵ پەیدا دەبێت . |
| ظُلة | Shade | چەتری گلۆپی کارەبا، کڵاوی گلۆپی کارەبا ، چەترێکە دەخرێتە سەر گلۆپی کارەبا بۆ ئەوەی لە تیشی ڕووناکییەکەی کەم بکاتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ظلف حافر ، سنبك | Hoof, Cloven | سم، پاقولاخ، پاقلاخ |
| ظلفيات | Cloven-hoofed, Cloven-foored | گیانداره سمدارەکان ، وەکو وولاخ و ئاژەڵ . |
| ظل، فی | Shade, Shadow, Umbra | سێبەر ، سایە، سەهون، سیتافك، سیتافیك . |
| ظل الارض على القمر ( عند الخسوف) | Umbra | سێبەری زەوی لەسەر مانگ لە کاتی مانگ گیراندا . |
| ظل الزاوية ، ظل هندسي ( ظا) | Tanget | سێبەری گۆشە، سایەی گۆشە ( سا) ، ڕێژەی نێوانی لای بەرامبەر و لای هاوسێی گۆشەکە لە سێگۆشەدا. |
| ظل تمام الزاوية ( ظتا) | Cotanget | سێبەری تەواو، سایەی تەواو ( ستا) ، ڕێژەی نێوانی لایەکی هاوسێ و لایەکی بەرامبەری گۆشەکە لە سێگۆشەدا دەکاتە هەڵگەڕانەوەی سایە . |
| ظل الصباح | Shadow at-morning | سایە( سێبەری بەیانی ) . |
| ظل المساء | Shadow at-evening | نسێ ( سێبەری نێوا ران). |
| ظل المطر | Rain shadow | دیوێك کە باران نایگرێتەوە . |
| ظلم | Stevia | ( ستیڤیا) ، گیایەکە گوڵی ئەرخەوانی یان سپی یان پەمەیی دەگرێت . |
| ظلم | Saliva, Slaver | ئاوی ناودەم، کەف ناودەم ، لیك . |
| ظلماء، مظلم | Obscure, Darksome | تاریك ، نووتك . |
| ظلمة | | بڕوانە ( ظلام) . |
| ظليلة ، سقيفة | Shed, bower | کەپر . |
| ظليل، معتم | Opaque | تەڵخ، تاریك ، ناڕۆشن . |
| ظليلية ، عتمة | Opacity | تەڵخی، تاریکی ، ناڕۆشنای. |
| ظُليل | Shady | نزار، سێبەر ، سەهەند، نسرم، نسار، دورهەتاو، بەسار |
| ظُليل، شبه الظل | Semidarkness, Penumbar | نیمچە سێبەر . |
| ظليل رطب | Shady humid( Place) | خۆرنەگەز، شوێنێکی سێبەری شێدار . |
| ظليم ذكر النعام، عسلق، عُسج | ( Male) Ostrich | نێرەی وشترمر . |
| ظما ،عطش | Thirst | تینوێتی . |
| ظما مائي | Hydrodipsia | تینوێتی بۆ ئاو ( وەکو لە ڕووەکدا) . |
| ظمآن، ظميء، ظامیء، عطشان | Thirsty | تینوو. |
| ظنبوب | Machilis | مێروویەکە لە هاریێ یان سۆلسۆلە دەچێت لە شێوەی تەشیلە یان لوولەکدایە، سێ پەلکە لەسەر توێکڵی درەخت دەژی . |
| ظنبوب ، قصبة الساق | Shin, Tibia | قامیشەی لاق، سپیلکاپێ، ئێسکێکی گەورەیە لەلاقدا . |
| ظنبوبي | Tibial | قامیشەیی، لاقی . |
| ظنب ، اصل الشجرة | Neck of the tree | بنکەدار ، کۆتکەدار . |
| ظنين ، متهم | Suspected | دڕدونگ، گومان لێکراو . |
| ظن، تخمين | Supposition, estimation | مەزننە، مەزندە، مەزنە |
| ظهارة ، نسيج طلائي | Epithelium | شانەی داپۆشەر ، ئەوشانەیەی کە لە لەشی زیندوو دادەپۆشێت لە ناوەوە یان لە دەرەوە . |
| ظهار، وجع الظهر | Notalgia | پشت ئێشە، ئازاری پشت |
| ظهر | Back, Tergum | پشت . |

| | | |
|---|---|---|
| ظهر | Spondylitis | سوتانەوەی بڕبڕەی پشت . |
| ظهري | Dorsal, Tergal | پشتی ، پشتە، هەر شتێك پەیوەندی بە پشتەوە هەبێت . |
| ظُهر ، ظهيرة | Noon, Midday | نیوەڕۆ ، نیڤرو ، چێشتەنگاو . |
| ظُهرية ، ملاح | Figmarigold | گوڵە نیوەڕۆ ، ڕووەکێکە گەڵاکەی گۆشتنە، گوڵی جوان دەگرێت . |
| ظهري | Notal, Tergal | پشتی ، شتێك پەیوەندی بە پشتەوە هەبێت . |
| ظهران | Elytron | کالانی باڵی مێرووی وەکو لە کولەدا هەیە . |
| ظهُرة ، سلحفاة | Tortoise | کیسەڵ . |
| ظهرة | Negligence, Omission | پشتگوێ خشتن . |
| ظهور | Appearance | ئاشکرابوون ، دەرکەوتن . |
| ظهور الأسنان، رشق الاسنان | Dentition, Eruption of teeth | ددان دەرهاتن . |
| ظهيرة | | بڕوانە ( ظهر). |
| ظهيرة بلورية ، حشيشة البلورية | Ice plant | گیا کریستاڵی ، گیایەکی دەشتەکی و کشتوکاڵی‌یە ، ئاوگی گەڵاکەی لە دروست کردنی کریستاڵدا بەکاردێت ، گوڵەکەی بچووك و سپی هەندێکی بەرەکەی دەخورێت . |
| ظيان ، ملعي ، ياسمين البر | Clematis | یاسەمینە کێویلە ، گیایەکی تەمەن درێژی کەپرییە گوڵی ئەرخەوانی یان سپی یان شین یان زەرد دەگرێت . |

| | | |
|---|---|---|
| عائلة ، عيلة | Family | خێزان ، بنەماڵە. |
| عائم | Swimming, Natant, Floating | سەرئاوکەوتوو. |
| عائش | Alive | ژیاو، زیندوو. زیندە . |
| عائل : مُضيف | Host | ژێنەر، بژێن، ئەو گیاندارەی کە مشەخۆری لەسەر دەژی ، واتە مشەخۆر دەژێنێت . |
| عائلة الحيات | Viperidae | خێزانی مار، کۆمەڵەی مار . |
| عائش على الدم | Hemophilic | خوێن خۆر، خوێن مژ، لەسەر خوێن دەژی . |
| عائدة ، عوائد ، عائدات | Benefit , Profit , Taxes, Dues, Proceeds | سوود، کەڵك، دەسکەوت، باج . |
| عائق ، مُعوق | Impedance | تەگەرە، بەرهەڵستی ، کۆسپ . |
| عائق الحقول، دانج، رجل القبرة | Field larkspur, Delphinium, Kings consound | پێ‌کلاوکورە، سەرەچۆلەکە، گیایەکی پزیشکی‌یە گوڵی شین دەگرێت دەرمانی لێ‌دەردەهێنرێت بۆ میزکردن و کرم فرێدان ، گوڵی شین یان سپی یان بنەوشەیی یان پەمەیی یان سوور دەگرێت . |
| عائق جبلي ، عشبة القمل ، زبيب بري | louse wort, Stavesacre | گیائەسپێ، گیایەکی پزیشکی‌یە گوڵی پەمەیی دەگرێت ، تۆوەکەی ژەهرینە ، درمانی کرم فرێدان و ڕەوان کردنی ئاژەڵ و کوشتنی ئەسپێ‌ی لێ‌دەردەهێنرێت . |
| عابر ، مار | Passing over, Travelling, Transient | ڕێبوار ، پەڕاوە . |
| عابر سبيل | Wayfarer | ڕێبوار ، ڕێڤنگ، ڕێونگ. |
| عابور ، طيور مهاجرة | Migrator birds | باڵندە کۆچکەرەکان ، باڵندە ڕەوەندەکان ، وەکو لەقلەق . |
| عابل ، نافض | Deciduous | گەڵاوەریو، هەر ڕووەکێك گەڵاکەی هەموو زستانێك بوەرێت . |
| عاتق ، كتف | Shoulder | شان، ئەستۆ، نێوانی شان و مل . |
| عاتق ( الميزان) | Beam of balance | شانی تەرازوو، شیشی تەرازوو کە دوو تاکەی پیادا هەڵواسراوە . |
| عاتقة، مزارة | Gapper | پاچەکۆڵە، پاچێکە بۆ بژارکردنی باخچە بەکاردێت . |
| عاتكة | Infertile, Unfruitful | درەختی زڕ، درەختی بێبەر . |
| عات، عاتي ، شديد | Violent, Fierce | بەتین، بەهێز، توند. |
| عاتية، ملتهمة البكتريا، لاقحة البكتريا | Bacteriophage | بەکتریا خۆر، بەکتریا هەڵلوشەر. |
| عاج ، ضجاج | Ivory | ددانی فیل، شفرەی فیل ، کەڵبەی فیل، شیرمایی ، مایی. |
| عاج السن | Dentin, Dentine | مایی ددان ، چینی ناوەڕاستی ددان کە دەوری کرۆکی ددانی داوە، بریتی‌یە لە مادەیەکی کلسی پتەو. |
| عاجز، مقعد | Disabled, Crippled, Weak, Powerless, Invalid | کەفتەکار، پەك کەوتوو، دەستەپارچە، داماو، لەکارکەوتوو . |
| عاجل، طارىء | Sooner, urgent | خێرا. |
| عاجلة ، قطار الاكسبريس | Express-train | شەمەندەفەری خێرا ( ئێکسپرێس) . |
| عادة، تقليد | Habit | خوو، ڕەوشت، نەریت، لاسا. |
| عادي ، إعتيادي | Normal, Habitual | ئاسایی. |
| عادة شهرية ، حيض | Menses periods, Menstruation | بێ‌نوێژی، کەوتنە سەر خوێن، حەیز . |

| | | |
|---|---|---|
| عصابة جبسية | Plaster bandage | سارغیی گەچین. |
| عصابة معكوسة | Reversed bandage | سارغیی پێچەوانە. |
| عصابة لولبية | Spiral bandage | سارغیی مارپێچی. |
| عصابة، جماعة | Band, gang, group | کۆمەڵ، دەستە. |
| عصابة الجبين | Brow band, frontlet | سارغی ناوچەوان. |
| عصابة الرأس | Head bandage | ١- مێزەر. ٢- بۆیەمە. ٣- سارغیی سەر. |
| عصام، حمالة، حمالة | Braces, suspenders | ئاسقی پانتۆڵ. |
| عصامي | Self made | خۆکرد، ئەو کەسەی خۆی خۆی پێگەیاندبێت. |
| عصافة، تبن | Cavings, chaff, straw, husk | کا، پووش. |
| عُصاب، اضطراب عصبي، عصاب نفسي | Neurosis | نیوڕۆسـیس، تێکچوونـی دەمـاریی، پشـێویی دەروونیـی، پەشـێویی دەماریی، نەخۆشییەکە دەروونی و ژیریی سووکە. |
| عصاب المفصل | Arthralgia | ئێشی جومگە. |
| عصاب القلق | Anxiety-neurosis | پەشێویی دەماریی راڕایی، نەخۆشییەکی دەمارییە، نیشانە سەرەکییەکەی ئەوەیە کە ئەو کەسە هەست بەترس و بێ ئارامییەکی گشتی دەکات لە لەشیدا بەبێ ئەوەی کە هۆیەکی ئاشکرا هەبێت بۆ ئەوە. |
| عُصاب الطيران | Aeroneurosis | پشێویی دەماریی، فڕین، ئەو شێوەی دەمارییەی لەو کەسانەدا ڕوودەدات کە لە فڕۆکەدا دەبن. |
| عصب، لبلاب | Glory bind | جۆرێکە لە رووەکی لاولاو. |
| عصب | Nerve | دەمار، پەی، دەماری جووڵانەوە و هەستکردن. |
| عصب، وتر | Tendon | ژێ. |
| عصبة (خلية عصبية) | Neuron | خانەی دەماری. |
| عصب رئيسي | Principle nerve | شادەمار، شاڕەگی گیاندار و دار و درەخت. |
| عصبي | Nervous, Nueral, neuro, neur | دەماریی، شتێك پێوەندیی بە دەمارەوە هەبێت. |
| عصبي المزاج | Nervous, nervy | قیسکە تەنگ، چیکڵدانە تەنگ، تووڕە و تڕۆ، رابەل، تەنگە تیلکی. |
| عصبية | Nervousness, nervosity | قیسکە تەنگی، کەم چیکڵدانەیی، تووڕە و تڕۆیی، رابەلی، تەنگەتیلەکەیی. |
| عصبيات الأجنحة | Neuroptera | باڵ دەمارییەکان، پلەیەکە (کۆمەڵێکە) لە مێروو وەکو شێرە مێش گەزۆ (اسد المن) کە مێرووییەکی زیانبەخشە بە رووەك. |
| عصب النساء، عرق النساء، عصب وركي | Sciatica, ischiatic nerve, sciatic nerve | دەماری سمت، دەماری پشتەوەی ڕان، دەمارێکە بە دیوی شتەوەی ڕانـدا تێپەڕ دەبێ، ئەو ئێش و ئازارانەی کە لەو دەمارەدا پەیدا دەبێت. |
| عصب سمعي | Acoustic nerve, auditory nerve | دەماری بیستن. |
| عصب حركي | Motor nerve | دەماری بزوێنەر، دەماری جوڵێنەر. |
| عصب سمباتي، عصب سمبثاوي، عصب ودي (عطوفة) | Sympathetic nerve | دەماری سیمپاتیتی، دەماری بەسۆز. |
| عصب شوكي | Spinal nerve | دەماری دڕکاوی. |
| عصب شمي | Olfactory nerve | دەماری بۆنکردن. |
| عصب قحفي | Cranial nerve | دەماری کاسەی سەر. |

| | | |
|---|---|---|
| عصب بصري، عصب البصر | Optic nerve | دەماری بینین. |
| عصب توامي ثلاثي، عصب جمجمي خامس | Trigeminal nerve | دەماری سێ جمکە، دەماری پێنجەمی کەللەی سەر. |
| عصب تائه، عصب حائر، عصب رئوي معدي | Vagus nerve, Pneumogastric nerve | دەماری سی گەدە، دەماری ئاوارە، ئەو دەمارەیە کە مەغزی لاکێشەییە وە دەچێت بۆ دڵ و بۆری هەوا و گەدە و ریخۆڵە و سییەکان. |
| عصب القلب، هيوفاريقون، داذي رومي | Hypericum, eola weed, goat weed, Rosir rose | هایپیریکەم، جۆرە دەوەن و گیایەکە هەندێکی دەشتەکییە بۆ مە بەستی پزیشکی و هەندێکی بۆ مەبەستی رازاندنەوە دەروێنرێت. |
| عصبة السوس، شمشم، بسلي امريكية | Jeouirity | پۆلکەی ئەمریکی، دەوەنێکە تۆوەکەی سور یان رەشە لەبواری پزیشکیدا بەکار دێت و هەروەها تەزبیح و ملوانکەی لێ دروست دەکرێت. |
| عصر (عملية)، اعتصار | Expressing, Pressing, Expression, Squeeze | گوشین، وشین، گلاشتن. |
| عصر | Evening, afternoon | عەسر، پاش نیوەڕۆ، ئێوارە، هێوارە. |
| عصر (زمن) | Epoch, age | ١- سەردەم. ٢- هەندێکی کەم لە دەیەها ملیۆن ساڵ. |
| عصر البرمائيات | Age of amphibians | سەردەمی تەرووشکییەکان، ئەو سەردەمە جیولۆجییەی کە گیاندارە تەرووشکییەکان تێدا پەیدابووە. |
| عصر الأسماك | Age of fishes | سەردەمی ماسییەکان، ئەو سەردەمەی کە گیانداری ماسیی تێدا پەیدابووە. |
| عصر الزواحف | Age of reptilians | سەردەمی خشۆکەکان، ئەو سەردەمەی کە گیاندارە خشۆکەکانی تێدا پەیدابووە. |
| عصر الثدييات | Age of mammals | سەردەمی شیردەرەکان، ئەو سەردەمەی کە گیاندارە شیردەرەکانی تێدا پەیدا بووە. |
| عصر الأوليجوسين، العصر الحديث اللاحق | Oligocene epoch | سەردەمی ئۆلیگەسین، سەردەمێکی جیولۆجییە لە نێوان سەردەمی ئیموسین. (١١) ملیۆن ساڵ بەردەوام بووە، هەندێک شێوەی ژیانی تازەی تیادا پەیدا بووە، وەکو پەیدابوونی بەراز و مێرووی هەمە جۆرە و باپیری ئەسپ و پشیلە و سەگ. |
| عصر البليوسين، العصر الحديث القريب | Pliocene-epoch | سەردەمی پلیۆسین، بەشی دوایی لە چاخی سیانی، سەردەمی نوێی نزیک کە (١٢) ملیۆن ساڵ بەردەوام بووە، جۆرەکانی گیاندارە شیردەرەکانی تیادا پەیدابووە. |
| عصر الباليوجين | Paleogene | سەردەمی پالیۆجین، بەشی گەورەی چاخی جیۆلۆجیی سێهەم کە بریتییە لە کۆی سەردەمی ئیوسین و ئۆلیگۆسین و پالیۆسین. |
| عصر الأيوسين، العصر الحديث السابق، فجر الحياة الحديثة | Eocene-epoch | سەردەمی ئیۆسین، سەردەمی بەربەیانی ژیانی تازە، کۆنترین ماوەیە لە چاخی سیانی (ترياس)، (٢٢) ملیۆن ساڵ بەردەوام بووە و هەندێک شێوەی ژیانی تازەی تێدا پەیدابووە. |
| عصر الباليوسين، العصر الحديث الأسبق | Paleocene (palaeocene) epoch | سەردەمی پالیۆسین، سەردەمی تازەی پێشووتر کە (٥) ملیۆن ساڵ بەردەوام بووە و ئەسپ و فیل و ئەمەنگی تێدا پەیدا بووە. |
| عصر البليستوسين، العصر الحديث الأقرب | Pleistocene epoch | سەردەمی پلیستۆسینی، تازەترین سەردەم، سەردەمی دوایی چاخی سیانی کە ملیۆنێک ساڵ دەبێت دەستی پێکردووە و جۆرەکانی مرۆڤی تێدا دەر کەوتووە. |

| | | |
|---|---|---|
| عصر الهولوسين، العصر الحديث | Holocene epoch (Reccent) | سەردەمی نوێ، سەردەمی تازە، کە نزیکەی (١٠-١٥) هەزار ساڵ لە مەو بەر دەستی پێکردووە. |
| عصر النيوجين | Neogene period or epoch | سەردەمی نیۆجین، سەردەمی میۆسین و پالیۆسین پێکەوە دەگرێتەوە. |
| عصر الأيوجين | Eogene period or epoch | سەردەمی ئیۆجین، سەردەمی ئیۆسین و ئۆلیگۆسین پێکەوە دەگرێتەوە. |
| عصر الميوسين | Miocene-epoch | سەردەمی میۆسینی، سەردەمی جیۆلۆجی تازە کە دەکەوێتە نێوانی پلیۆسینی و ئۆلیگۆسینییەوە. (١٢) ملیۆن ساڵ بەردەوام بووە. سەگ و مێروولە و باڵندەی زەلکاوەکان و کرکەدەن و فیل و مەیمونە سەرەتاییەکانی تێدا پەیدابووە. |
| عصر برونزي | Bronze age | سەردەمی برۆنزی، ئەو سەردەمەیە کە مرۆڤی کۆن ئامرازی لە برۆنز دروستکراوی تیادا بەکار هێناوە. |
| عصر الأنسان | Age of man, Psychozoic, Anthropozoic | سەردەمی مرۆڤ، ئەو سەردەمە جیۆلۆجییەی کە مرۆڤ و نیمچە مرۆڤی تیادا هاتۆتە کایەوە. |
| عصر ذري | Atomic age | سەردەمی گەردیلەیی، سەردەمی ئەتۆمی، ئەو سەردەمەی کە بۆ یەکەم جا وزەی گەردیلە تێدا بەکار هات لە بواری جەنگ و پیشەسازیدا. |
| عصر جليدي | Ice age, Glacial | سەردەمی سەهۆڵ، یەکێکە لە سەردەمەکانی پێش مێژوو، کەوا تیایدا سەهۆڵ زۆربەی رووی زەویی داپۆشیوە. |
| عصر حجري | Stone age | سەردەمی بەردین، ئەو سەردەمەیە کە مرۆڤی کۆنی پێدا تێپەڕبوو و ئامرازی بەردینی بەکار هێناوە. |
| عصر حجري سحيق | Eolithic | سەردەمی بەردینی هەرەکۆن. |
| عصر حجري قديم | Paleolithic | سەردەمی بەردینی کۆن. |
| عصر حجري أوسط | Mesolithic | سەردەمی بەردینی ناوەڕاست. |
| عصر حجري حديث | Neolithic | سەردەمی بەردینی نوێ. |
| عصري، حديث | Modern, New | تازە، نوێ، سەردەمی. |
| عصص، اصل الذنب | Coccyx, caudal bone | بنی کلك، بێخی کلك. |
| عصعص، عُصعوص، أصل الذنب | Coccyx, urostyle, cauda bone | کلێنچکە، جوچکە، قەمچك. |
| عصعصي | Coccygeal | کلێنچکەیی، شتێك پێوەندی بە کلێنچکەوە هەبێت. |
| عصعص الطيور، زمكي | Uropygium, | کلێنچکەی باڵندە، سمتە جۆڵەی باڵندە. |
| عصف | Hay | کا، هەلیز، سەمەری. |
| عصفة | Blade | گەڵای گەنم و جۆ. |
| عصفور البيت، عصفور دوري، عصفور شائع | Sparrow, passer, House sparrow | چۆلەکە، کێشکە، ملیچك، چیچك، کەلوچك، پاساری، حتە، چقیك، پەلکانك، بەراش، چویك، بادانە، سواندۆکە، پیتیك. |
| عصفور الجنة، خطاف | Bird of peradise, Swallow | پەرەسێلکە. |
| عصفور الجنة | Apus | پەرەسێلکە، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| عصفور سميلي | | جۆرێکە لە باڵندەی بۆقژە لە ناو داری سنەوبەردا دەژی. |
| عصفور ابيض | White sparrow, white finch | گاچیرین، چۆلەکەی سپی. |
| عصفور جبلي | Mountain sprrow | چۆلەکە کێوی. |

| | | |
|---|---|---|
| عصفور خضاري | Green finch | چۆلەکە سەوزە. |
| عصفور الصنوبر | Pine siskin | چۆلەکەی سنەوبەر، چۆلەکەیەکە پەرەکەی هێڵدارە. |
| عصفور تفاحي، زقيقية | Linnet | چۆلەکە سێویی، رەنگەکەی مەیلەو سوورە. |
| عصفور الثلج | Snow finch | چۆلەکەی بەفر. |
| عصفور التين | Fig finch | چۆلەکەی هەنجیر. |
| عصفور الشوك | Accentor, Hedge sparrow, hedge-warbler | چۆلەکەی درك، جۆرە چۆلەکەیەکە بەری درەختی دڕکاوی دەخوات. |
| عصفور الأزرق | Blue bird | چۆلەکە شینە، چۆلەکەیەکی شینە لە باکووری ئەمریکا دەژی. |
| عصفور الأرز، عصفور الرز | Java sparrow, Rice bird | چۆلەکەی برنج، چۆلەکەی جاوا، باڵندەیەکی ئەمریکیی بچووکە لە چۆلەکە دەچێت. |
| عصفور الصباح، عصفورة الذعرة | Wagtail | کلك هەڵسەرنگێنە، کلك هەڵتەکێنە. |
| عصفور صغير | Small sparrow | چڕە، جوڕە. |
| عصفورة، دسرة في النجارة | Dowel, dowel-pin | سنگ، مێخ (بەتایبەتی لە دیواردا). |
| عصفورية | Heterotoma | گیا چۆلەکە، رووەکێکە گوڵەکەی لە چۆلەکە دەچێت. |
| عُصفُر، قرطم، قرطم الصباغين، زعفران كاذب | Safflower, False saffron, Bastard saffron | کاژیلە، زەرتك، کابیشە، گیایەکی ساڵانەی زستانەیە، گەڵاکەی خڕە، قەراغەکەی گرنجگرنجە، گوڵەکانی بە شێوەی هێشووی زەردەن. رەنگێکی زەردی مەیلەو سووری لێ دەر دەهێنرێ بۆ رەنگکردنی خواردەمەنی، هەروەها کەڵکی پزیشکیی هەیە بۆ نارەقکردنەوە و بۆ رەنگکردنی ئاوریشم و دروستکردنی سوراو. |
| عصف، هبوب | Blowing of wind, Blast | هەڵکردن، وەکو هەڵکردنی با. |
| عصف، عصافة | Glume | قنچکی گوڵ، گەڵایەکی ئەستوورە دەوری گوڵی داوە. |
| عصل، عصلة، غار وردي، دفلي | Rhododenron, Oleander | ژاڵە، جۆرە دار و دەوەنێکە گوڵی سپی یان بنەوشەیی یان ئەرخەوانی دەگرێت. بۆنخۆش و ژەهرینە. |
| عصلج، صابونة مخزنية، عرق الحلاوة | London pride, soap wort | رووەکی سابون، رووەکێکە گەڵا و ڕەگەکەی جۆرە ئاوگێکی تێدایە لە جیاتی سابون بەکاردێت. رووەکێکی گیایی تەمەن درێژی ژەهرینە لە کۆمەڵەی مێخەکە. |
| عصمة، قلادة | Necklace | ملوانکە. |
| عصمور، قادوس | Noria scoop | سەتڵی جەنجەڕی ئاو هەڵکێشان. |
| عصوي، عصوية | Bacillary | چیلکەیی، باکتریای چیلکەی. |
| عصوية، ذيل القط | Herds grass, Phleum | کلکە پشیلە، گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵو دان بۆ لەوەڕ باشە. |
| عصير، رُب | Must, Juice, succus | گوشراو، شیلە، شەربەت، ئاووگ، رینگ، رینگاڵ. |
| عصير الحصرم | Verjuice | ئاوی بەرسیلە، کەستاو، قوڕە. |
| عصير نباتي | Juice | گوشراوی رووەك، شلاوی رووەك، ئاووگی رووەك. |
| عصير البرتقال | Squeeze | ئاوی پرتەقاڵ، شەربەتی پرتەقاڵ. |
| عصير الرمان، رب الرمان | Rob (rhob) of pomegrante | قاتوڵی، ربەنار، شەبرمان. |
| عصير الفواكة | Must, fruit juce | خۆشاو، خۆشاف، ئاوی میوە. |
| عصير الزبيب | Must of (grapes) | خۆشاوی مێوژ، شەربەتی مێوژ. |

| | | |
|---|---|---|
| عصير الدُب، قطلب شائع، جناء احمر | Arbute, strawberry tree, cane-apple | شلێکی درەخت، دارو دەوەنێکە قەدەکەی قیتە، گەڵاکەی بۆ دەباخکردن باشە. گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویەکی پەمبەییە، بەرەکەی لە توترك یان شلیك دەچێت، ڕەنگەکەی سوور یان ئەرخەوانییە. |
| عصية | Stick, Rod | دار، چیلکە، چڵو چێو، شڤك، هێزم، چەوێڵ. |
| عُصية (عصيان) | Bacillus | باسیلەس، باکتریای چیلکەیی: جۆرێکە لە باکتریا، لە چیلکە دەچێ، نەخۆشیی دەرم بڵاو دەکاتەوە. |
| عصية كوخ | | میکرۆبی کوخ، میکرۆبی سیل. |
| عصية ضمية (شولية) | Comma bacillus | میکرۆبی وێرگولی. وەکو میکرۆبی نەخۆشی کۆلێرا. |
| عصيات الزحار | Dysenteric bacillus | میکرۆبی سکچوون. |
| عصيات الكزاز | Tetani bacillus | میکرۆبی دەردەکۆپان. |
| عصي الشبكية | Rhabdomes (rods) of retina | چیلکە تۆڕیی، چەپکە تەنێکی شێوە چیلکەییە، لە تۆڕینەی چاوی گیانداره جومگەدارەکاندا هەیە. |
| عصيفة | Husk, chaff, glumella | گەڵای گەنم. |
| عُصيف | Ligularia | لیگولاریا، گیایەکە گەڵاکەی خڕە، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی زەرد یان پرتەقاڵییە. |
| عصفيرة، عصفير، بها، زهرة مجزاعة | Garden balsam, Impatiens | شەو بۆی زەرد، هەمیشە بەهار، گوڵە چاو ئێشە، بەیبوون، بەڵسەمی باخچە، بەلسەمی سەوز، گیایەکە بەرەکەی درێژکۆلەیە، تۆوەکەی خڕ و قاوەییە. |
| عصيدة، ثريد | Gruel porridge, atheroma | ترێت، پەڵوولە، پلور. |
| عصيدة نباتية، اغار اغار | Agar-agar | ئەگار ئەگار، مادەیەکی لینجە لە هەندێك قەوزە دەر دەهێنرێت بۆ مەبەستی زاوزێ پێکردنی میکرۆب و لە پیشەسازی کاڵاوی کاغەزدا بەکار دێت. |
| عصيم، ورقة نباتية | Leaf | گەڵای درەخت. |
| عض | To bite, Biting | گاز گرتن، گەستن، قەپ گرتن، قەپاڵ لێگرتن، لەق گرتن. |
| عض الشفة | Cheilophagia | لێو گەزتن، لێو کرۆشتن. |
| عض اللسان | Odaxesmus | زمان گەزتن، زمان کرۆژتن. |
| عضُ الاظافر | Onychophagy | نینۆك کرۆژتن. |
| عض، عضة، عضاء | Hawthorn | گۆێژ، ڕووەکێکی دڕکاوییە، بەرەکەی خڕ و زەردە، ترش و شیرینە یان سوور و شیرینە. |
| عضاهة، عضة | Thornyplant | درەختێکی گەورەی دڕکاوییە. |
| عضادة | Strut, alidade | دەسك، باهووی دەرگا، گرێژنەیی دەرگا، قوڵفە، مشتو، ئەسپەرە، کلکە بێڵ، مشتۆی دەست پێوەگرتنی تیغ و چەك و داس و زۆر شتی تر. |
| عضادة الباب | Door jamp | دەسکی دەرگا. |
| عُضاد، الم العضد | Brachialgia | ئازاری بازوو، ئێشی قۆڵ. |
| عضاض، عضوض | Mordacious | گەزنە، گەزندە. |
| عضال، عقام | Irremediable, Obstinate, Incurable | دەردەی بێ دەرمان، دەردی ماندووکەر، نەخۆشیی قورس، نەخۆشیی درێژخایەن. |
| عضة الصقيع | Frost-bitten, freezing | ڕەقبوونەوە بە هۆی سەرماوە. |
| عضب | Sword | شێر، شمشێر. |
| عضب، عجل | Calf | گوێرەکە، گۆلك. |

| | | |
|---|---|---|
| عضبة، عشبة البيكار | Compass plant, polar plant | دمونێکە گوڵەکەی زەردە و قەدەکەی ناوگێکی ڕێسینی تیایە. |
| عضة، لسعة، لدغة عضد | Bite | قەپ، قەپال، گەزتن، گاز. |
| عضد | Upperarm, arm, Brechium | بازوو، باهوو، بازوڵە، پیپل، قۆڵ. |
| عضدي (عظم) | Humerus | ئێسکی بازوو، ئێسکی نێوان نانیشك و سەرشان. |
| عضديات الأرجل | Brachiopoda | قاچ بالییەکان، کۆمەڵە گیاندارێکی نیمچە کرمن. |
| عضرفوط، حبينة، ام حبين، كمكة، قاضي الجبل | Calotes, Judge of the desert, agama | قۆری، جۆرە مارمێلکەیەکە کە تەماشای ئەملاو ئەولای خۆی دەکات. سەری بەرز دەکاتەوە، سەری سێ سووچ و پشتی پۆپنەی پێوەیە. |
| عضرس، خمطية برية | Althaca, alcea, Wild hillyhock | هێرۆکێویلە، جۆرێکە لە رووەکی هێرۆ. |
| عُضل | Gerbil | جرج، جۆرە مشکێکە لە کێڵگەدا دەژی، مشکی ناومال، ڕەنگەکەی قاوەیی کاڵە. |
| عضل اليان | Fat-tailed gerbil | مشکێکی زۆر گەورەیە. |
| عضلة | Muscle, Myon | ماسوولکە، ماینچە، ئەندامێکی ریشاڵییە توانای کرژبوون و کشانی هەیە، وا لە گیاندار دەکات کە بجووڵێت. |
| عضلة مخططة (ارادية) | Striated muscie (voluntary) | ماسولکەی میلدار (هێڵدار)، لەبەر ئەوەی هێڵی تۆخ و کاڵی تیادایە. |
| عضلة العارضة الكبرى | Zygomaticus, Major Muscle | ماسوولکەی بەری چاو. |
| عضلة جبهية | Frontalis Muscle | ماسوولکەی ناوچەوان (ئەنیی). |
| عضلة صدغية | Temporal Muscle | ماسوولکەی لاجانگ، ماسولکا جنووکێ. |
| عضلة صدرية | Pectotalis, Muscle | ماسوولکەی سنگ. |
| عضلة قفوية | Occipitalis- Muscle | ماسوولکەی پشتمل، زەبلەکا، پاتکاسەری. |
| عضلة التكيف البصري، عضلة هدبية | Muscle accomode, ciliary Muscle | ماسولکەی گونجاندنی بینین لە چاودا. |
| عضلة الظهر | Dorsal Muscle | ماسوولکەی پشت، پالانجە، پالأنی. |
| عضلة ذات راسين | Biceps Muscle | ماسوولکە دووسەر. |
| عضلة ارادية | Voluntary- Muscle | ماسوولکەی ڕکێفی، ئەو ماسوولکەیەی کە بە ئارەزووی گیاندار دەجووڵێتەوە. |
| عضلة لاارادية | involuntary- Muscle | ماسوولکەی نارکێفی، ئەو ماسوولکەیەی کە بەبێ ڕکێفی گیاندار دەجووڵێتەوە وەکو ماسوولکەی ناوپەنچك. |
| عضلة احشائية | Visceral- Muscle | ماسوولکەی هەناویی. |
| عضلة الساق | Shin Muscle | پووز، ماسوولکەی قاچ. |
| عضلة بطنية | Adbominal Muscle | ماسوولکەی سك. |
| عضلة قابضة | Flexor, Corrugator Muscle | ماسوولکەی گرژکەر. |
| عضلة الشرج | Anal Muscle | زۆتك، لێواری کونی کۆم، ماسوولکەی کۆم. |
| عضلة إليية | Gluteus Muscle | ماسوولکەی سمت. |
| عضلة غير مخططة | Unstripped muscle | ماسوولکەی میلنەدار، هێڵنەدار، بێمیل، بێهێل. |

| | | |
|---|---|---|
| عضلة مخططة | Striped muscle, Striated muscle | ماسوولكەی میلدار (هێڵدار). |
| عضلة القلب | Myocardium | ماسوولكەی دڵ. |
| عضلة عاصرة | Sphincter muscle, Flexor muscle | ماسوولكەی گوشەر، ماسوولكەی وشەر، ماسوولكەیەكی ئەڵقەییە دەوری كونەكانی لەش دەدات وەكو كۆم و كونی نێوان گەدە و دوانزەگرێ. |
| عضلة باسطة | Extensor muscle | ماسوولكەی كشێنەر. |
| عضلة حاصرة للبول | Cut off muscle | ماسوولكەی میزڕاگر. |
| عضلة ملساء | Skin muscle, Plain muscle, Smooth muscle | ماسوولكەی لووس. |
| عضلي | Myodes, Muscular, Musculous | ماسوولكەیی، لە شێوەی ماسوولكەدا. |
| عضلة رقيقة | Gracilis- muscle | ماسوولكەی تەنك. |
| عضلة الفخذ | Ham muscle | ماسوولكەی ران. |
| عضم، مذراة | Fork | شەن، چەتاڵ. |
| عضو | Organ, Member | ئەندام، (ئۆرگان) یان پارچە شتێك. |
| عضوي | Organic | ئەندامیی، ئۆرگانی، شتێك پێوەندی بە ئەندامەوە هەبێت. |
| عضو الملماس | Palpal organ | ئەندامێكە لە جاڵجاڵۆكەی نێردا هەیە بۆ گواستنەوەی شلەی سپێرمی بۆ لەشی مێیەكە. |
| عضو الأستجابة | Answering-organ, Granting-organ | ئەندامی وەڵامدانەوە، وەكو لە هەندێك گیاندار دا هەیە. |
| عضو التوازن | Balancing (static)-organ | ئەندامی لەنگەر گرتن، هەر ئەندامێك یارمەتیی لەنگەر گرتن بدات. |
| عضو ذكري | Male organ | ئەندامی نێرەكی. |
| عضو انثوي | Female organ | ئەندامی مێینە. |
| عضو وضع البيض، اشرة، مرز | Oviposition, Rhabdite | ئەندامی هێلكە دانان، وەكو لە كوللەدا. |
| عضو الجماع | Coition organ | چووك، كێر، ئەندامی جووتگرتن لە نێرەی گیانداردا. |
| عضو اكس | X-organ | ئەندامی ئێكس، ئەندامێكە لە گیانداره توێكڵدارەكاندا هەیە، جۆرە هۆرمۆنێك دەر دەدات بۆ رێكخستنی كرداری توێژفڕێدان و هەرس و زاوزێ و رەنگی لەش. |
| عضو التكاثر، عضو التناسل | Sexual organ, Genital organ | ئەندامی زاووزێ لە زیندەوەردا. |
| عضو الحس | Sense organ | ئەندامی هەست. |
| عضو الحس الجانبي | Neuromast-organ | ئەندامی هەستی لاتەنیشت. |
| عضو كورتي | | ئەندامی كۆرتی، ئەندامی بیستن لە قاقڵەی ناوەوەی گوێدا ئەو ئەندامەی كە نووساوە بە پەردەی بنكی ناوەوەی گوێچكەوە، خانەی دەنگ وەرگری تیادایە. |
| عضو التغريد، حنجرة الصوت | Syrinx | ئەندامی خوێندن لە باڵندەدا، قورگی خوارەوەی باڵندەكە دەكەوێتە گۆشەی نێوان دوولقەكەی بۆریی هەواوە. |
| عضو اثري | Vestigial-organ, Rudimenlary organ | ئەندامی پووكاوە، ئەندامێك كە لەوەو پێش فرمانێكی بووبێت لە لەشدا بەڵام ئێستا نەیمابێت وەكو ریخۆڵە كوێرە. |
| عضوا جاكوبسن | | دوو ئەندامەكەی جاكۆبسن، دوو ئەندامی بۆنكردن دەكەونە مەڵاشووی مارەوە، پێوەندییان هەیە بە بۆنەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| عضوالأبراز، عضو الأفراغ | Excrefory-organ | ئەندامی دەر هاویشتن، وەکو دەر هاویشتنی میز و پیسایی و ئارەق. |
| عضو التلقيح، عصقول | Copulatory-organ | ئەندامی پەڕین، وەکو لە گیاندار و ڕووەکدا. |
| عضو بويانس | Bojanus organ | ئەندامی بۆیانس، گورچیلەی گیانداری گوێچکەماسی. |
| عضو انتاج، ملف | Armature | ئارمیچەر، کلافە تەلێکە لە دینەمۆ یان مۆتۆری کارەباییدا هەیە. |
| عضو كهربائي | Electric organ | ئەندامی کارەبایی، شانەیەکی ماسولکەیی گونجاوە لە لەشی هەندێك ماسیدا، توانای پەیداکردن و هەڵگرتنی وزەی کارەبایی هەیە وەکو لە ماسییەتریشقەدا کە کارەبا دەگرێتە دوژمن لە کاتی مەترسیدا. |
| عضو مضيء | Light organ | ئەندامی ڕووناککردنەوە. |
| عضو جولين | | ئەندامی (جولین) ، ئەندامی بۆنکردن یان شوێن بۆنکەوتن لە پەپولەدا. |
| عضو كيبر | | ئەندامی کیبەر، تۆیەڵێکە لە خانەی دەر دەری قاوەیی یا مەیلەو سوور نووساوە بە پەردەی دڵی گوێچکەی ماسییەوە. |
| عضو ليدج | Leydigs organ | ئەندامی لیدیگ، چاوی لاتەنیشتی گیاندارە خشۆکەکان. |
| عضو مولر | | ئەندامی مولەر، ئەندامی هەستکردن بە دەنگ لە مێرووودا. |
| عضو اللؤلؤ | Pearl organ | ئەندامی مرواری، ئەندامی هەستکردن لەسەر پێستی هەندێك جۆری ماسیدا هەیە. |
| عضو قفوي | Nuchal organ | ئەندامی پشتەمل، وەکو لە هەندێك گیانداردا هەیە. |
| عضو التقشيط | Rasping organ | ئەندامی داتاشین، زمانێکی ددانداره لە گیاندارە بڕبڕدارە نزمەکانی وەکو دەم بازنەییەکاندا هەیە. |
| عضو غير تام النمو | Rudimentary organ | ئەندامی ناتەواو، ئەو ئەندامەی کە گەشەی نەکردبێت و نەگەیشتبێتە هەنگاوی فرمان جێبەجێکردن. |
| عضو سيبولد | | ئەندامی سیبۆڵد، ئەندامی هەستکردن بە دەنگ لەسەر قامیشەی لاقی دواوەی مێرووە کوللەییەکاندا هەیە. |
| عضو اسفنجي | Spongy organ | ئەندامی ئیسفەنجی، تۆیەڵێکە لە خانەی تۆڕیی لە لەشی هەندێك گیانداری وەکو گوڵاڵەی دەریادا هەیە. |
| عضو تحت الركبة | Subgenual organ | ئەندامی ژێر ئەژنۆ، گرێیەکی دەمارییە لە قامیشەی لاقی هەندێك مێرووودا هەیە. |
| عضو تومو سفاري | | ئەندامی تۆمۆسڤاری، چاڵێکی هەستکردنە لە پشت بنکی قۆچی هەستکردنی لای زۆربەی گیاندارانی پێ لچیدا (هەزار پێ) هەیە. |
| عضو طبلي | Tympanal organ | ئەندامی تەپڵی، ئەندامێکە لە لەشی گیاندارە جومگەدارەکاندا، لە وە دەچێت کە پێوەندیی بە هەستکردن بە دەنگەوە هەبێت. |
| عضو خضري | Vegetative organ | ئەندامی سەوزینە، ئەو ئەندامەی کە لە ڕووەکدایە و پێوەندی نییە بە کرداری زاوزێیەوە. |
| عضو دهليزي، عضو ردهي | vestibular organ | ئەندامی ڕاڕەوی، ڕیزێکە لە مەمیلە بە باری پانی لە پشت ددانەکانی گیاندارە شەویلکە ڕێشودارەکاندا هەیە وەکو کرمە تیرییەکان. |
| عضو ويبر | | ئەندامی ویبەر، بریتییە لە میزڵانێکی پوکاوە لە نێرەی گیاندارە شیردەرەکاندا. |
| عضو عجلي، عضو دولابي | Wheel organ | ئەندامی ڕەوڕەوەیی، بۆرییەکی ڕێشودارە لە ناو کلاوەی سەری گیانداری شیردەرەکاندا |
| عضو صغير | Organule | ئەندامی بچووك، ئەندامۆکە، ئەندامۆلە. |
| عضو بسيط | Organite | ئەندامی سادە. |

| | | |
|---|---|---|
| عضوانية | Organicism | ئەندامێتی، تیورییەکە (بیردۆزەیەکە) دەقەکەی دەڵێت کەوا کردارە زیندەگییەکان لە ئەنجامی چالاکیی هەموو ئەندامەکانی لەشی زیندەوەر پێکەوە دێنە بەرهەم. |
| عضو شرجي، عضو استي | Anal organ | ئەندامی کۆمیی، ئەندامی قنگ، هەر ئەندامێکی لوودار نزیکی کونی قنگ بێت. |
| عضو الاستشعار، مجسة | Antennal-organ | قۆچی هەستکردن، شاخی مێروو. |
| عضو ابطي، غدة ابطية | Axial gland (crinoidea) | ئەندامی بنباخەڵ، لووی بنباخەڵ، ئەندامێکە (لوویەکە) لە شێوەی رووەکی زەمەقدا (زنبق). |
| عضو جرسي، عضو ناقوسي | Organ bell | ئەندامی زەنگۆڵەیی، ئەندامێکە بەسەر لەشی مێرووەوە. |
| عضو بدر | | ئەندامی بیدەر، بریتییە لە پاشماوەی هێلکەدان لە هەندێك نێرەی بۆقی بێ کلکدا. |
| عضو مخيخي | Cerebral-organ | ئەندامی مێشکۆڵەیی، ئەندامێکی دەماریی بۆشە لە لەشی هەندێك کرمدا. |
| عضو ذوغرف، عضو ذو فسح | Chamberded-organ | ئەندامێکی پێنج ژووریی (کەلێنی)یە لە لەشی هەندێك گیاندارە پێست درکاوییەکاندا. |
| عضو التسلق | Climbing organ | ئەندامی هەڵگەڕان، ئەندامی سەرکەوتن، ریزە پوولەکەیەکی ئەستوورە لە بنی کلکی هەندێك گیاندارە قرتێنەرەکاندا. |
| عضو كوبسي | Cupola organ | ئەندامی کاسۆلەیی، ئەندامی مژۆکی، ئەندامێکی هەستە لە شێوەی زەنگۆڵەدا لە لەشی گیاندارە جۆمگەدارەکاندا. |
| عضو فوق الغدة التناسلية | Epigonal-organ | ئەندامی سەر لووی زاوزێ، لوویەکی لیمفییە نووساوە بە لووی زاوزێوە لە هەندێك ماسیدا. |
| عضو فخذي، عضو الفخذ | Femoral-organ | ئەندامی ران، ریزێکە لە لوو لەسەر پێستی رانی هەندێك مارمێلکەدا. |
| عضو غربالي | cribriform-organ | ئەندامی بێژنگی، بریتییە لە چەند تەبەقێك لە کالسیۆم بە پەردەیەکی تەنك داپۆشراوە لەسەر دەستی هەندێك گیاندارە پێست درکاوییەکاندا. |
| عضو قيثاري | Lyriform organ | ئەندامی گیتاری، ئەندامێکە لە لەشی جاڵجاڵۆکەدا فەرمانەکەی پەیوەندی هەیە بە هەستی کیمیاییەوە. |
| عضو كمثري | Pyriform-organ | ئەندامی هەرمێیی، لوویەکی رەگەزیی ناوەنجی (پاشکۆ) یە لە گیانداری تەربیلاریادا. |
| عضو رئيسي، عضو اساسي | Fundamental-organ | ئەندامی سەرەکی، ئەندامی بنچینەیی، ئەندامی خۆراکیی لە لەشی رووەکدا. |
| عضو جرابر، عضو غرابر | | ئەندامی گرابەر، ئەندامێکی ئاڵۆزە لە لەشی مێتولکەی مێشە سەگانەدا، فەرمانەکەی هێشتا نەزانراوە. |
| عضو هالر | | ئەندامی هالەر، ئەندامێکی هەستکردنە لە گیانداری گەنەدا. |
| عضو هانستروم | Hanstrom-organ | ئەندامی هانسترۆم، لوویەکی دەماریی دەر دەرە لە لاسکی بنی چاوی هەندێك لە جۆرەکانی قرژاڵدا. |
| عضو الايلاج | Intromi Hent | ئەندامی پێداکردن، هەر ئەندامێکی نێرینە لە شێوەی چووکدا بێت بۆ پیاکردن بە لەشی مێدا گونجابێت بۆ مەبەستی پەڕین. |
| عضو جونستون | Johnstonion organ | ئەندامی جۆنستۆن، ئەندامێکی هەستکردنە بە دەنگ لە بنکی شاخۆچکەی هەندێك مێروودا. |
| عط، شق | Slit | درز، قڵیش. |
| عطاء، هبة | Gift, Offer | بەخشین، خەڵات. |

| | | |
|---|---|---|
| عطار، بائع الطيوب | Haberdasher, Perfumer, Grocer | عەتر فرۆش، عەتار. |
| عطار، دلاع | Strombus lantiginosus | جۆرێکە لە گوێچکە ماسی بۆنی خۆشی لێ دەر دەهێنرێت. |
| عطار صيدلي، بائع العقاقير | Druggist | بازرگانی دەرمان، دەرمان فرۆش، ئەجزاچی. |
| عطارد، سنبل رومي | Celtic valerian, Celtic spikenard | سونبول، گیایەکی تەمەن درێژە گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی سپی یان سوور، رەگەکەی ئەستوورە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| عطارد | Mercury | زاوە ( مێرکەری)، ئەستێرەیەکی گەرۆکە (٣٦) ملیۆن میل لە خۆرەوە دوورە، تیرەکەی (٣٢٠٠ ) میلە، سوورەکەی بە دەوری خۆردا بە نزیکەی (٨٦ ) رۆژ تەواو دەکات. |
| عطاس، عطس | Sneezing | پژمین، پژمە، بهنژین، پرمە. |
| عُطاش، سهاف | Polydipsia | تینوێتیی‌زۆر بە تین، تینوێتی نەشکان. |
| عطان، عفص، تنين، حامض التنيك | Tannin, Tannic acid | تانین، ترش تانیك، مادەیەکی دەباخکەرە لە جەوت (کڵاوی بەڕوو) و مازوودا هەیە. |
| عُطالة، بطالة | Idleness | بێکاری، بێئیشی. |
| عطالة، قصور ذاتي | Intertia | بار نەگۆڕین، ئەوەیە کە هەموو تەنێك دەیەوێت لە بارە بنەڕەتییەکی خۆیدا بمێنێتەوە، سا جماوبێت یان وەستاوبێت، مەرگەر هێزێکی دەرەوە کاری تێبکات. |
| عطب، تلف | Injury, Damage | پەککەوتن، فەوتان. |
| عُطب، قطن | Cotton | لۆکە. |
| عطبة | | نەخۆشییەکی پیسە. |
| عطبول، عوهج، ظبية طويلة العنق | Gerenuk | (جێرینوك)، ئاسکی ملدرێژ. |
| عُطبة، عطاب | | بۆنکروون، بۆکروون، بۆنسۆ، بۆسۆ. |
| عطرة، خبازة مجعدة | Curled-mallow | تۆڵەکە چرچە، جۆرێکە لە رووەکی تۆڵەکە. |
| عطرة، ديسمة | Diosma, Buckuplant | عەترینە، دەوەنێکە بۆ رازاندنەوە، گەڵاکەی بۆنی عەتری لێدێت. |
| عطر، زيت الورد، طيب | Perfume, Attar, Otto, Aroma, Scent, Specis, Essential oil | بۆن، عەتر، بێن، بۆنخۆش، گوڵاو، بۆن و بەرامە، رۆنی سەرەکی لە رووەکدا. |
| عطري، أرج | Aromatic, Fragrant, Sweet smelling | بۆنخۆش. |
| عطريات، أروميات، مركبات أروماتية | Aromatics, Aromatic compounds | ئاوێتە ئەرۆماتیکییەکان، کۆمەڵەیەکن لە ئاوێتەی ئەندامی هایدرۆکاربۆنیی زنجیرە داخراوەکە، بۆنێکی تایبەتیان هەیە وەکو ئاوێتەی بەنزۆل. |
| عطر القداح، دهن القداح | Neroli oil | بۆنی قەداح، بۆنی گوڵی پرتەقاڵ و نارنج. |
| عطر، بزاليا عطرية | Sweet-peas | گوڵە عەتر، گیایەکە گوڵی جوان و بۆنخۆش دەگرێت. |
| عطرف | Viper | ئاژدیها، مارێکی گەورەیە. |
| عطس | | بڕوانە (عطاس). |
| عطش، ظمأ | Thrist, Dipsia | تینوێتی، توونێتی، تینووبوون. |
| عطشان | Thristy | تینوو، تینگ، تهنی، تێنی. |
| عطشجي، وقاد الآلة | Fireman, Stoker | تونچی، ئەو کەسەی ئاگری کورە دەکاتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| عطف | Kindness | بەزەیی، دڵسۆزی، سۆز. |
| عطفة، ساق ملتفة | Volubile stem | قەدی ئاڵۆ، ئەو قەدە ڕووەکییەی کە خۆی دەئاڵێنێت لە شتی ترەوە. |
| عطفة، حالق، ارشية، عنمة | Tendril, Cirrus | تەرز، تەرزی ڕووەکی مێوو کولەکە کە خۆی دەئاڵێنێت بە دار و ڕووەکی ترەوە. |
| عطفة، منعطف | Turning-lane | کۆڵانێك پێچی تیابێت، پێچ. |
| عطفة رومية | Virginia silk, Silkvine | دەوەنێکی کەپرییە بۆ ڕازاندنەوە. |
| عطفة، زقاق | Lane | کۆڵان. |
| عطف، سوار الهند | Screw tree, Twisted horn | بازنی هیندی، دەوەنێکی هەمیشە سەوزە، گوڵی ئەرخەوانی یان زەرد دەگرێت، بەرەکەی وەکو قوتویەکی پێچاوپێچ وایە. |
| عطل، عجز | Disability, Incapacity | پەککەوتن، بێکاربوون. |
| عطلة، عطلة مدرسية | Vacation, Holiday | پشوو، وەکو پشووی هاوینەی قوتابخانەکان. |
| عطن، تعطين | Maceration, Retting | خوساندن، نەرمکردنی شتێك بە خوساندن بۆ جیاکردنەوەی ڕیشاڵەکانی. |
| عطن القنب، تعطين القنب | Retting of flax | خوساندنی ڕووەکی گوش بۆ جیاکردنەوەی ڕیشاڵەکانی. |
| عطوس، عاطوس، نشوق | Snuff | برنووتی، برنویت، تۆزێکی مەیلەو قاوەییە دەکرێتە لووتەوە بۆ پشمین. |
| عطوف | Sympathetic, kind, Affectionate | دڵسۆز، سۆزدار، بە سۆز. |
| عطوب، هش، قصيف | Fragile, Friable | خاو، فشەڵ. |
| عطيم، غنافليون، برسية | Cud weed, Hore wort | گیایەکە گوڵەکەی ڕیشاڵی سپیی پێوەیە لە لۆکە دەچێت. |
| عطيل، جُش، كُش، منبر، اسدية | Androcium | ئەندامی نێرەکیی لە ڕووەکدا. |
| عظامة، أرداف مستعارة | Bustle | سمتی خواستەمەنی، سمتی دەستکرد. |
| عظاءة، عظاية، سحلية، سقاية | Lizard, Lacerta | مارمێلکە، بڵقەدەر، شەوگەرد، خلنەزەر، گیاندارێکی خشۆکی لووسە خێرا دەڕوات و دەوەستێت. |
| سحلية مطوقة، سحلية ذات طوق | Collared, Lizard | مارمێلکەی یەخەدار، جۆرێکە لە مارمێلکە سەری زلە و کلکی درێژە. |
| عظائيات | Saurians, Lacertidae | مارمێلکەییەکان، کۆمەڵە گیاندارێکە وەکو مارمێلکە و شەوگەرد. |
| عظاءة أغوانا، أجوانا | Iguana | ئیگوانا، جۆرێکە لە مارمێلکە، گەورەو گیاخۆرە، لە ناوچە گەرمەکانی ئەمریکادا دەژی. |
| عظاءة ولودة | Viviparous-lizard | مارمێلکەی بزۆك، جۆرێکە لە مارمێلکە، بێچووەکانی ڕاستەوخۆ لە سکی دێنە دەرەوە واتە هێلکەکانی لەناو سکیدا هەڵدێن. |
| عظاءة شهباء، عظاية الجدران | Wall lizard | شەوگەرد، مارمێلکەی دیوار. |
| عظاية خضراء | Green lizard | مارمێلکەی سەوز. |
| عظاءة طائرة، تنين طائر | Flying dragon, Draco lizard | مارمێلکەی فڕندە، جۆرە مارمێلکەیەکە پێستێکی تەنك وا بە قاچە لاوازەکانییەوە، یارمەتیی دەدات بۆ بازدانی لە درەختێکەوە بۆ درەختێکی تر. |
| عظاءة عمياء | Blind worm | کرمە کوێرە، جۆرێکە لە مار مێلکە. |
| عظاية، ورل | Lacerta | بزن مژ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باکوورییە. |
| عظاءة تنينية، ورل | Varanus, Monitor Lizard, Varanian, Warran lizard, Dragon of lizard | بزن مژ، جۆرێکی مەزنە لە مارمێلکە. |
| عُظام | Osteopathy | نەخۆشیی ئێسك. |

| | | |
|---|---|---|
| عظر، عزارة | Azara | ئەزارا، دەوەنێکە گوڵەکەی بچووك و سەوزە، بەرەکەی لەترێ دەچێت، رەنگەکەی پرتەقاڵییە. |
| عظل | Copulation | جووتگرتن یان پێوەندیی گیاندار وەکو لە سەگدا. |
| عظلم، وسمة، ورد النيل | | وسمە، چویتە کێویلە، گیایەکی کشتوکاڵییە، قژی پێ رەش دەکرێت. |
| عظم | Bone, Os | ئێسك، ئێسقان، پروسك، هەستی، هێستك، شانەیەکی بەستەری کلسییە بەشە سەرەکییەکەی پەیکەری ئێسکی زۆربەی گیاندارە بڕبڕەدارەکانی پێکهێناوە. |
| عظمي | Bony, osseous, osted | ئێسکیی، شتێك پەیوەندی بە ئێسکەوە هەبێت. |
| عظمي (سابقة) | Oster-, Oste | پێشگرێکە بە مانای ئێسك. |
| عظموت، مرض العظمة | Paranoia, Paranoea | نەخۆشـی لـە خۆبـاییبون، نەخۆشـی خۆبـەزل زانـین، نەخۆشـییەکی دەروونییە. |
| عظمة، فخامة | Majesty, Pride | شکۆ، سەروەری. |
| عظم هلالي | Lunate | ئێسکە کەوانەیی، لە باسکی مرۆڤدا هەیە. |
| عظم الترقوة | Clavicle, Collar bone | ئێسکی چەڵەمە، ئێسکی چۆڵەمە، کلیکاملی. |
| عظم كعبري، عظم الكعبرة | Radius bone | ئێسکی قەڵەمەی گەورەی باسك. |
| عظم الزند | Ulna bone, Cubiod bone | ئێسکی قەڵەمەی بچووکی باسك. |
| عظم ركابي | Stapes | ئێسکە ئاوزەنگی، لە گوێچکەدایە. |
| عظم السنداني | Incus | ئێسکە دەزگایی، لە گوێچکەدایە. |
| عظم مطرقي | Malleus | ئێسکە چەکوشیی، لە گوێچکەدایە. |
| عظم السلامية، عظم الأصبع | Phalanges | میچ، ئێسکی پەنجە. |
| عظم الوجه | Facial bone | ئێسکی دەموچاو. |
| عظم الحافر | Coffin bone | ئێسکی سم، ئێسکی سمی وڵاخ. |
| عظم الشظية | Fibula | ئێسکی تەڵەزم لە لاقدا. |
| عظم الحوض | Pelvic bone | ئێسکی سێبەندە. |
| عظم لامي، عظم قاعدة اللسان، فريكة | Hyoid bone | ئێسکی لامی، ئێسکێکە لە بنی زماندا. ئێسکێکە لە شێوەی پیتی یووی ئینگلیزیدا (U) کەوتۆتە ژێر ملەوە. |
| عظم طويل | Long bone, Ossa longa | ئێسکی درێژ. |
| عظم عريض | Short bone, Ossa lata | ئێسکی کورت، ئێسکی پان. |
| عظم اليدس | Furcula, Wishing-bone | ئێسکی تەڵەمشکێنە (چەڵەمەشکێنە) کە لە ژمارەی حەوت (٧) دەچێت لە باڵندەدا هەیە یاری پێدەکرێت. |
| عظم القصبة، عظم قائمة الفرس | Cannon bone | ئێسکی پەلی وڵاخ، وەکو لە ئەسپدا. |
| عظم العانة | Pubis bone | ئێسکی بەر. |
| عظم العجز | Sacral bone, Sacrum | ئێسکی سمت، سمتە جوڵە، گۆرتیخ. |
| عظم غشائي | Membrane-bone | ئێسکی پەردەیی . |
| عظم العضد | Humerus bone | ئێسکی باهوو، ئێسکی بازوو. |
| عظم حقّي، كاسي الشكل | Cotyloid bone | ئێسکی کاسەیی، ئێسکێکی درێژ سەرەکەی لە کاسە دەچێت. |
| عظم ذقني | Mental bone | ئێسکی چەناگە . |

| | | |
|---|---|---|
| عظم مكعبي، عظم فردي | Cuboid bone | ئێسكە شەش پاڵوویی. |
| عظم طبلي | Tympanic- bone | ئێسكی پەردەی گوێ. |
| عظم الفك | Mandibular- bone, Maxillar bone | كاجیرە، ئێسكی شەویلكە . |
| عظم الخد، العظم الزوجي، العظم الوجني | Zygoma | ئێسكی ڕوومەت. |
| عظم الفك العلوي | Maxillary bone | ئێسكی شەویلكەی سەروو، لاما ژوریی . |
| عظم الفك السفلي | Mandibular bone | ئێسكی شەویلكەی خواروو، لاما ژێری. |
| عظم زاوي | Angular bone | ئێسكی گۆشەدار. |
| عظم مربع | Quadrate bone, Square bone | ئێسكی چوارگۆشە، یەكێكە لە ئێسكەكانی كاسەی سەر . |
| عظم مفصلي | Articular bone | ئێسكی جومگەیی . |
| عظم الفخذ | Femur, Thigh bone | ئێسكی ڕان. |
| عظم القصّ | Breast bone, Sternum | ئێسكی كۆڵەی سنگ، پەراسووبەند، ئێسقانی كۆڵەكەی سنگ. |
| عظمين، بروتين العظم | Ossein | ئێسكین، مادەیەكی ئەندامی‌یە لە پێكهاتنی ئێسكدا هەیە. |
| عظم جناحي | Pterygoid- bone | ئێسكە باڵی ، ئێسكێك یان كۆمەڵە ئێسكێكە بە بارێكی ئاسۆیی لە شەویلكەی سەرەوە یان لە مەلاشووی زوربەی گیاندارە بڕبڕەدارەكاندا هەیە. |
| عظم القصبة، ظنبوب | Tibia bone | قامیشە، قەڵەمەی گەورەی لاق، لولاق، ساقوڵ، لاق. |
| عظم أنفي | Nasal bone | ئێسكی لووت. |
| عظم الشظية | Fibula | ئێسكی تەڵەزم، یەكێكە لە دوو ئێسكەكەی لاق. |
| عظم المشطيدوي | Metacarpus, Metacarpal bone | ئێسكی لەپی دەست، ئەو ئێسكەی كە دەكەوێتە نێوان مەچەك و پەنجە لە دەستدا. |
| عظم المشطقدمي | Metatarsus, Metatarsal bone | ئێسكی لەپی پێ، ئەو ئێسكەی كە دەكەوێتە نێوان مەچەك و پەنجە لە پێدا . |
| عظم الجمجمة | Calvarial, Cranial bone | ئێسكی كاسەی سەر ، ئێسكانە . |
| عظم الكاحل، عظم المطرقي | Ankle- bone, Astragalus bone, Malleus | ئێسكی ڕەقەڵە، ڕەقەڵەی قاچ، قولەپێ، گۆزەنك. |
| عظم الكتف، لوح الكتف | Scapula- bone, Shoulder blade | ئێسكی دەفەی شان، دەفەی شان . |
| عظم جلدي | Dermal bone | ئێسكی پێستی. |
| عظم رقائقي | Lamellar bone | ئێسكی توێژاڵی، ئێسكێكە لە توێژاڵی تەنكی تەریبی پێكهاتووە. |
| عظم الكعب، عقب القدم | Heel- bone, Calcaneus | ئێسقانی پاژنە، ئێسكی پاژنە ، پاژنەی پێ پاشپانی . |
| عظم العصعص | Coccyx | ئێسكی كلێنچكە، ئێسكی كلێژی. |
| عظم الكرسوع ، الكامل | Talus | قەڵەمی بچووكی دەست، كۆتایی قەڵەمەی بچووكی دەست كە لە پەنجە تووتەوە نزیكە . |
| عظم الكوع | Funny bone, Internal condyle | زەنگە، قەڵەمەی گەورەی دەست، كۆتایی ئێسكی قەڵەمەی گەورە كە لە پەنجە گەورەوە نزیكە. |
| عظم الردف | Innominate- bone | ئێسكی سمت، سمتە جووڵە . |
| عظم سنّي | Dentary bone | ئێسكی ددان. |

| | | |
|---|---|---|
| عظم مصفوي، عظم منخلي ، عظم غربالي | Ethmoid bone | ئێسكی بێژنگی، بریتی‌یە لە بنكەی لووت لە كەللەسەردا، ئێسكی دیواری لووت لە نێوان هەردوو كونە لووتدا، ستونكا دفنێ. |
| عظم الميكعة، عظم المنخرين | Vomer- bone | ئێسكە گاسی، ئێسكی دیواری لووت لە نێوانی هەردوو كونەلووتدا. |
| عظم الورك | Ischium bone | ئێسكی هەنگل، ڕەقینەری قنگ، كەماخ، ئێسكی گوڵمە. |
| عظم العفريت | Dioscorea, Collroot, | ئێسكی دێو، سەلكی ڕووەكی پەتاتەی شیرین ( پەتاتەی چینی ) كە بۆ چارەكردنی ژانەسك بەكاردێت . |
| عظم جبهي | Frontal bone | ئێسكی سەرووی ناوچەوان، ئێسكی ئەنێی. |
| عظم صخري | Petrosal bone | ئێسكی بەردین، بەشێكە لە ئێسكەكانی كاسەی سەر، كە گوێچكەی ناوەوەی تیادایە ، لە گیاندارە شیردەرەكاندا . |
| عظم جداري | Parietal bone | ئێسكی پشتی سەر، یەكێكە لە ئێسكەكانی دیوی پشتەوەی كاسەی سەر، هێستكی تاتی. |
| عظم إسفنجي | Sponge bone, Cancellus bone | ئێسكی ئیسفەنجی . |
| عظم تحت اللسان | Entoglossal bone | ئێسكی ژێر زمان . |
| عظم حجاج العين، عظم محجري | Orbital bone | ئێسكی كالانەی چاو، ئێسكی چاڵی چاو . |
| عظم حرقفي | Hip- bone, iliac bone | ئێسكی كلۆت، یەكێكە لە ئێسكەكانی سێبەندە، ئێسكی كورماتیخ. |
| عظم صدغي | Temporal bone | ئێسكی لاجانگ، هێستكی جنووكێ. |
| عظم طويل، مشاش | Diaphysis bone | ئێسكی درێژ، قەدی ئێسك . |
| عظم بلعومي | Gular bone | ئێسكی گەروو. |
| عظم لاحق | Accessory bone | ئێسكی پاشكۆ. |
| عظم هش | Brittle bone | ئێسكی خاو، ئێسكی فشەڵ. |
| عظم غضروفي | Cartilage bone | ئێسكی كڕكڕاگەیی. |
| عظم مصمت | Compact bone | ئێسكی پتەو. |
| عظم مستدير، كامل، كروي | Orbicular bone | ئێسكی بازنەیی، ئێسكی خڕ. |
| عظم قنزعي | Astragaslus bone | ئێسكی كلاوی، ئێسكی پۆپنەیی، ئێسكە گەورەكەی، پاژنەی پێ. |
| عظم غطائي | Opercular bone | ئێسكی قەپاغی ، ئێسكی سەرقاپی كەوانەی ڕیشەداری ماسی. |
| عظم أسفيني، عظم وتدي، اسفيني | Parasphenoid- bone, Cuneiform bone | ئێسكی مێخی، ئێسكی سنگی. |
| عظم الركبة، رضفة، صابونة الركبة، الرضفة | Knee-cap, Patella bone | ئێسكی كلاوەی ئەژنۆ. |
| عظم لامسمى، عظم الردف | Innominate bone | ئێسكی بێناو، ئێسكی نیوەی پشتێنەی سێبەندە. |
| عظم وجني | Malar bone, Oszygomaticum, Jugal bone | ئێسكی كوڵم، ئێسكی ڕوومەت. |
| عظم الصين | Bone china | ئێسكە چینی، جۆرێكە لە مادەی پۆرسلین. |
| عظم إكليلي، عظم تاجي | Coronoid bone | ئێسكی تاجۆكەیی، ئێسكی گوڵبەندی . |
| عظم قفوي، عظم مؤخري | Occipital- bone | ئێسكی لای خوارەوەی پشتی سەر، هێستكی پاتكا سەری. |
| عظم الرسغ | Wrist (bone) Tarsal (bone) | ئێسكی مەچەك. |
| عظم الرسغيدوي | Carpal bone | ئێسكی مەچەكی دەست . |

| | | |
|---|---|---|
| عظم الرسغ، عظم القدم | Carpopedal bone, Tarsal bone | ئێسکی مەچەکی قاچ ، ئێسکی پاژنە پێ، ئێسکی بازنداپێ. |
| عظم غرابي | Caracoid bone | کرۆچەلە، کرۆژمڵە، ئێسکێکی نەرمە بە دەفەی شانەوە . |
| عظم متحجر | Osteolith | ئێسکی بەردەوەبوو، ئێسکی بووبەرد. |
| عظم دمعي، عظم حجاجي | Lacrimal- bone | ئێسکی کالانەیی، ئێسکی فرمێسکی ، ئێسکی کالانەی چاو. |
| عظم زورقي | Scaphoid bone, Navicular, Radiale | ئێسکی بەلەمی، یەکێکە لە ئێسکەکانی مەچەکی پێ . |
| عظم ولحم | | گرتك، پارچەیەك لە گۆشت بە ئێسقانەوە. |
| عظم الحنك | Palatine bone | ئێسکی مەلاشوو. |
| عظم جفني | Palperba bone | ئێسکی پێڵوویی، ئێسکی پێڵووی چاو وەکو لە گیانداره خشۆکەکان و باڵندەکاندا دیارە. |
| عظيم | Great, Big, Major | گەورە، مەزن، زل. |
| عُظيم، عُظيمة | Ossicle, bonelet, Ossiculum | ئێسکۆکە، ئێسکی بچووك، ئێسکۆڵە. |
| عظماني | Osteoid | ئێسك شێوە، هەر شتێك لە ئێسك بچێت . |
| عظيمات، كاملات العظام | Teleost | ماسییە ئێسکدارەکان ، زۆربەی جۆرەکانی ماسی دەگرێتەوە. |
| عفارة المساحيق، منفاخ المساحيق | Powdery, Powder duster | تۆزوەشێن، پەمپ، ئامرازی قانگدان، ئامرازی پرژاندنی دەرمان بۆ قەلاچۆی مێروو. |
| عفار، قطلب ، قاتل ابيه، جناء احمر | Arbutus | دەوەنێکە گوڵی سپی یان مێخەکی دەگرێت . |
| عفارة | Toglean | خەرمان بەرەکەت، بەرەلاکردنی باخ و بێستان دوای چنینەوەی زۆربەی بەروبوومەکەی بۆ ئەوەی خەڵکی بە خێر بیخوات. |
| عفازة | Nut, Walnut | گوێز ، بەری دار گوێز . |
| عفاس | Nyroca | جۆرێکە لە مراوی رەنگی سپی و خۆڵەمێشی و سوور و شین و بنەوشەیی و رەشی تیایە. |
| عفاس ابلق | Scamp | مراوی بەڵەك. |
| عفاس ابيض، عفاس كبير | Several-duck | مراوی سپی. |
| عفاس اشهب | Pochard | مراوی رەش و سپی. |
| عفاس متوج، ونس | Crowned duck | مراوی کڵاودار . |
| عِفاوة، باكورة | First of the thing | بەرکوڵ، سەرگوڵ، نۆبەرە. |
| عفاص القنينة | Capsule of a bottle, bottle stopper | سەرقاپی بوتڵی شووشە. |
| عِفة، عفاف | Virtue, Chastity | داوێن پاکی . |
| عفج، الأثناعشري | Duodenum | ریخۆڵەی دوانزە گرێ و باریکە . |
| عفد، لغبد، ترمجان | Lagopus, Grouse, Ptarmigan | جۆرێکە لە سوێسکە یان قەتێ، رەنگی زوو زوو دەگۆڕێت لە نێوان سپی و قاوەیی بە پێی وەرز . |
| عفر، عُفار، تراب | Dust | خۆڵ، گڵ. |
| عُفر | Oreotragus | جۆرێکە لە بزنە کێوی. |
| عفر، عُفر، رت، حلوف، خنزير بري، هلوف | Hog, Boar, Wild boar (male) | ١- یەکانە، بەرازی نێر، بزەبەران. ٢- بەرازە کێوی. |

| | | |
|---|---|---|
| عُفرة، عفراة، | 1- Hood | پەڕی ملی کەڵەشێر. |
| عفرية، برائل | 2- Mane | یال، یاڵی ئەسپ. |
| عفري | Pulverulent | گەندەموو، تووکی ورد. |
| عفريت | Devil, Demon | خێو، درنج، دێو، دێودرنج، فیلەتەن، ئەرژەنگ، شەیتان. |
| عفريت تسمانيا | tasmanian-devil | خێوی تاسمانیا، گیاندارێکی گۆشتخۆری ناشرینی دڕندەی تورەکەدارە بەقەدەر سەگێك دەبێت، لە ناوچەی تاسمانیا دەژی. |
| عفريتة رفع | Lifting Jack | جەگ، ئامرازی شتومەك بەرزکردنەوە. |
| عفش، عفاشة | Trash, Rubbish | شتومەکی هیچ و پوچ لە ناو ماڵدا، شڕکەو پڕکە، پڕوپاتاڵ. |
| عفش المسافر | Baggage | باروبارگە، کەلوپەل. |
| عفشة، سقيط | Pluck, Harslet | ناوسك، هەناو، ناوزك وەکو سی و جگەر و دڵ و ورگ. |
| عفص، عفص البلوط، بلوط العفص | Gall oak, Nut-gall oak | مازوو، مازك، مازی، درەختێکە لە کۆمەڵەی بەڕووە، بەرێکی خڕی چۆکڵەداری هەیە، پێی دەگوترێت (مازوو) بۆ دەباخکردن و دروستکردنی ڕەنگ بەکاردێت، درەختێکی کەژییە بەهایەکی بازرگانی زۆری هەیە. بەری درەختی مازوو ١٨ جۆرە، هەمووی سوودبەخشە:- ١- مازوو ٢- بەرەگەڵا ٣- پاڵەوانە ٤- پانکە ٥- پوزەخوگە ٦- بەڕوو ٧- تسقل، گزگل، خرنوك ٨- قژگەسوورە ٩- گلۆوان ١٠- جەوت، جەفت، جەوتی مازوو وەکو جەوتی بەڕو گرنج گرنج نی‌یە بەڵکو سافە ١١-سپێلکە ١٢- سوێرەکە ١٣-سیچکە ١٤- شاخدار ١٥- گەزگل ١٦- گەزومازوو ١٧- موخور، دەموکانە ١٨- گۆلوان. |
| عفصات، تنات | Tannate | (تەننات)، خوێی ترشی تانیك، ئەو ترشەی کە لە مازوو دەردەهێنرێت. |
| عفصة، عفص طحلبي | Bedeguar, Rose-gall, Cecidium | باهاورد، گرێیەکە لەسەر لەشی ڕووەك (وەکو گوڵەباخ) پەیدا دەبێت، بەکاری مێروو یان مشەخۆری گیانەوەریی یان ڕووەکی. |
| عفص الجذور | Eelworn, Disease, Root knot | مازووی ڕەگ، ئەستوور بوونی ڕەگی ڕووەك بە هۆی هەندێك کرمی دەزوولەیی‌یەوە کە دەبێتە هۆی زەرد بوون و سیسبوون و خێرامردنی ڕووەکەکە. |
| عفص البرتغال، عفص حلبي | Portuguese-oak, Gall oak | مازووی پورتوگال، مازووی حەلەب، جۆرێکە لە داری مازوو بەرەکەی ڕەنگی ڕەشی لێدروست دەکرێت بەتایبەتی بۆ دروستکردنی مەرەکەب. |
| عفص | Acrid, Astringent | تفت و تاڵ. |
| عفص، مرض العفص | Gall-sickness, Anaplasmosis | نەخۆشی مازوو، نەخۆشی‌یەکە تووشی ئاژەڵ دەبێت بەهۆی گەنەوە بڵاو دەبێتەوە. |
| عفص مشوه | Nubbin gall-nut | زۆڵەکی مازوو، سیچکە، بەری مازوو کە بەتەواوەتی گەشەی نەکردبێت. |
| عفصية، آبرة، قنقشة | Cynips, Gallfly | مێشی مازوو، جۆرە مێروویەکە بەسەر ڕووەکەوە دەژی و مازووی لەسەر پەیدا دەکات. |
| عفصية، ثويا | Thuya, Thuja, Arbor vitae | (ثۆیا) مازوویی، سەرووی مازوو درەختێکە لە کۆمەڵەی سنەوبەر خێرا گەورە دەبێت بۆ پەرژین و ڕازاندنەوەی باخچەکان دەڕوێنرێت، بەرێك دەگرێت لە مازوو دەچێت. |
| عفصات الترتر | Spangle-galls | مازووی پولەکەیی، جۆرە گرێیەکە لەسەر گەڵای داربەڕوو دروست دەبێت، بەهۆی گەرای مێروویەکی تایبەتی‌یەوە. |
| عفط، عفطة | Snorting | جڕت، زرت، پژمینی بزن. |

| | | |
|---|---|---|
| عفن | Mold, Mould | کەڕوو، پرگ، کەڕوویەك بە میکرۆسکۆپ دەبینرێت لەسەر مادەی ئەندامیی دەژی و خراپی دەکات. |
| عفن، متعفن | Mouldy, Musty | بۆگەن، کەڕواوی. |
| عفن، عفونة | Mouldines, Rotteness, Mustiness, Putridity, Rot | بۆگەن، بۆنی ناخۆش، بۆگەنی کەڕوو، بۆگەنبوون، ڕزینی بەر و تۆوی ڕووەك لە ئەنجامی کەڕووی میکرۆسکۆپی یەوە. |
| عفن الخبز | Bread mold | کەڕووی نان، کەڕوو. |
| عفن أزرق | Blue-mold | کەڕووە شینە، نەخۆشی یەکە بە هۆی جۆرە کەڕوویەکەوە (فطر) تووشی پرتەقاڵ دەبێت، پەڵەی بچووك لەسەر بەرەکەی پەیدا دەبێت، ناوەڕاستەکەی شین دەبێت و دەزوولەی سپیی لێ پەیدا دەبێت. |
| عفن أخضر | Green-mold | کەڕووە سەوزە، نەخۆشی یەکە تووشی میوە دەبێت. |
| عفن البطاطس | Patato rot | کەڕووی پەتاتە، نەخۆشی یەکە تووشی قەد و گەڵا و سەلکی پەتاتە دەبێت بە هۆی کەڕووەوە. |
| عفن رمادي، عنقودية رمادية | Grey mould, Grey rot | کەڕووی خۆڵەمێشی، نەخۆشی یەکە لە ترێ دەدات. |
| عفن مخاطي بكتيري، فطرغروي | Slime, Myxomycetes | کەڕووی لینج. |
| عِفو، عَفو، جحش | | جاشەکەر. |
| عفوة، عفاوة، ريمة، رغوة الطبخ | Scum, Skimmings | کەفی چێشت. |
| عفوصة | Acridity | تفتی و تاڵی. |
| عفونة | Rot, Rottenness | بۆگەنی، نەخۆشی ڕووەك بە هۆی کەڕووەوە. |
| عفونة الدم النزفية، ابوخنجر، اجهس، ابوهذلان، اوريلي | Hemorrhagic septicemia | مشە، نەخۆشی یەکی تیژە تووشی گا و مانگا دەبێت، بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی و ئاوسانی سی و گەدە و ڕیخۆڵەی لەگەڵدایە. |
| عفونيات | Mucorineae | ڕووەکە کەڕووی یەکان، بە میکرۆسکۆپ دەبینرێن. |
| عقاب | Eagle | داڵ، داڵاش، قوش، زیمونج، باڵندەیەکی گۆشتخۆرە، چرنووکی تیژە دەنووکی چەماوەیە، مەچەکی هەتا ئاستی پەنجەکانی بە پەڕ داپۆشراوە. |
| عقاب، نسر طائر | The eagle, Aquila | بورجی داڵ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| عقاب اسود | Black eagle | قرەقووش، داڵی ڕەش. |
| عقاب البادية، عقاب مسرولة، خدارية | Booted eagle, Steppe-eagle | داڵی بیابان، باڵندەیەکی گۆشتخۆرە، داڵی پەڕ لە پێ. |
| عقاب مؤزرة، سهوك | Pseudaetus, Wrapped eagle | داڵی بەروانکەدار. |
| عقاب البحر، شميطة، مورينة | Eagle ray, Myliobates | داڵ ماسی، ماسی یەکی دەریایی کلکداری گەورەی پانکەڵەیە، کلکی باریکە لە بنکەکەیدا چزووی تیژ هەیە، ماسیی تر دەخوات. |
| عقاب البحر | Erne, Sea eagle | داڵی دەریا، باڵندەیەکی گەورەیە لە کۆمەڵەی هەڵۆ چاو و دەنووك و قاچی زەردە لە کەناری دەریا و زەلکاوەکاندا دەژی. |
| عقاب الحيات | Serpent eagle | داڵی مارخۆر. |
| عقاب الماء، صرارة، نسر صارخ | Short toed eagle | داڵی ئاویی، داڵێکی گەورەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| عقاب نسارية | Eagle-vulture, osprey | دالە سیسارك، جۆرە سیسارکێکە دەچێتە دەریاوە بۆ ماسی خواردن. |
| عقاب ذهبية، عجز، لماعة | Golden eagle | دالی زێرین، جۆرە دالێکی زۆر گەورەیە و درندەیە. |
| عقاب أمريكي | Harpy eagle | دالی ئەمریکی. |
| عقاب رخماء | White headed eagle, Bald eagle | دالی سەرسپی. |
| عقاب سفعاء، صقر الأرانب، نسر ارقط | Rough footed, Spotted eagle | دالی کەروێشك خۆر، دالێکی گەورەیە پەرەکەی قاوەیییە، پەڵەی زەردی تێدایە. |
| عقاب قيصرية، كركش، ملك العقبان، قرقوش، خائتة، خاطية | Imperial-eagle | شادال، قەرەقووش، جۆرە دالێکی گەورەیە. |
| عقاب بيضاء الذنب | White-tailed eagle | دالی کلك سپی. |
| عقار، عقارات | Real estate, Real property | زەوی و زار. |
| عقّار، دواء | Drug, Pharmacon | داوو دەرمان، دەرمان. |
| عقار ( عقاقير) السلفا | Sulfa drugs | دەرمانەکانی سولفا، کۆمەڵە دەرمانێکن گۆگردیان تیادایە دژی میکرۆب بەکاردەهێنرێن لە چارەکردنی زۆر نەخۆشیدا وەکو دەرمانی سولفاتیازۆل. |
| عقاري | Landed | زەوی و زاریی، وەکو بانقی زەوی و زاری . |
| عقاص | Braiding | قردێلە، ئەو شریتەی کە کچان قژی پێدەبەستن. |
| عقاصة، فتالة | Tortrix, Leafroller moth | مۆرانەیەکی ( پەپوولەیەکی) زیان بەخشە بە رووەك. |
| عقاف | | نەخۆشییەکە دەدات لە پەلی مەڕ و خواری دەکات . |
| عقافة | Throwing stick, Boomerang | چالاك، دارێکی درێژی سەرچەماوەیە جاران باڵندەیان پێ ڕاودەکرد. |
| عقال | Fancy head-band | عەگال، مشکی، سەرپێچ. |
| عقام، عضال | Incurable | دەردی بێدەرمان، دەردی درێژخایەن. |
| عقاد، حائك الاشرطة، قزاز | Braid weaver | قەزاز، جولای شریت و گوڵنکە. |
| عقال الدابة ، قيد | Fetters, Shackles | پێوەند، ئەو کۆتەی کە قاچی چوارپێی پێ دەبەسترێت . |
| عقان، شطء | Sucker | نەمام، خەڵف. |
| عُقال | Limp, Halting | نەخۆشییەکە لە قاچی وڵاخ ( چوارپێ) دەدات. |
| عُقبولة، حلأ، هرص، قرحة البرد | Cold sore, Darte aftermath | تامێسك، ئەو زیپکەیەی کە لە دەم دێت لە ئەنجامی لەرزوتاوە. |
| عقبول | Sequela | نەخۆشی ناوەنجی، هەر نەخۆشییەك یان دیاردەیەك لە لەشدا کە لە ئەنجامی نەخۆشییەکی سەرەکییەوە رووبدات وەك تامێسك . |
| عُقب | Stub | پاشماوەی شت . |
| عقبان | Eagles, Aquila | دالەکان، کۆمەڵێکە لە باڵندە. |
| عقب القدم، مؤخرة القدم | Calcaneum, Heel | پاژنەی پێ، پەحنی، قولەپێ، گورێژنگ، مەچەکی قاچ، پانی، پشت پەمنی. |
| عقبي | Calcaneal | پاژنەیی، هەر شتێك پەیوەندی بە پاژنەوە هەبێت . |
| عقب السيكاير | Stump cigarette end | قنگە جگەرە، ناغزە جگەرە. |
| عقبة، حائل | Obstacle | کۆسپ، تەگەرە، قۆرت. |

| | | |
|---|---|---|
| عقب عودة البندقية، قرنافة، قرناغة | Gun stock | قوناغە تفەنگ. |
| عُقبة، كرزات | Desserts, Dried-Fruits and seeds | شەوچەرە، چەرەس. |
| عقة، زغب | Down, Nap, Soft hair | كورك، گەندەموو، كەنگەموو. |
| عقد، قلادة | Necklace | ملوانكە ، گەردانە، رستك. |
| عقد، سند | Document, Deed, contract | قەواڵە، سەنەد، پەيوەست نامە. |
| عقد | | رست، رشتە. |
| عقد، اتفاق | Contract, Indenture agreement | رێكەوتن، رێكەوتنێك كە نووسرابێتەوە . |
| عقد | Decade, Ten years period | دە ساڵ، ١٠ ساڵ. |
| عقد الزواج | Marriage lines, Matrimong certificate | مارەكردن، قەواڵەی ژنهێنان . |
| عقد، إنعقاد | Setting (of fruit) | هەڵپێچان، سەرەتای پەيدابوونی ( خڕبوونی) بەری درەخت. |
| عقد، عقادة، قوس | Arch | كەوانە، تاق، تاقی سەر دەرگا، عەگادە. |
| عقدة، عجرة | Wen, Knob, Knot | گرێ، گرێی لقی یان قەدی رووەك. |
| عقد التامين ، بوليصة التأمين | Insurance policy | قەواڵەی مسۆگەركردن. |
| عقد البيع | Deed of sale | قەواڵەی فرۆشتن . |
| عقد الإيجار | Lease, Deed, Contract of rent | قەواڵەی بەكرێگرتن، وەكو بە كرێگرتنی خانوو و زەویوزار . |
| عقد ، قنطرة | Vault | پرد. |
| عقدة | Ganglia, Ganglion, Node | گرێ. |
| عقدي | Nodal | گرێیی، گرێدار. |
| عقدة سمباتية، عقدة سمباثيتية | Sympathetic ganglion | گرێی سیمپاثیتی، دوو ریز گرێی دەماری لەملاولای برېرەی پشتەوە . |
| عقدة والتر | nglion | گرێی والتەر، گرێی دەماریی سیمپاتی لە كلێنچكەدا . |
| عقدة الدونية، عقدة النقص، شعور بالنقص | Inferiority-complex | گرێی هەستكردن بە كەمی ، هەستكردن بە نزمی، نەخۆشییەكی دەروونییە نەخۆشەكە وادەست دەكات كە لە خەڵك كەمترە . |
| عقدة الأب، عقدة الكترا | Father complex, Electra complex | گرێی باوك، ئارەزوويەكی پەچێنراوە (سەركوت كراوە) لە كچدا بەرامبەر بە باوكی ، ئەمەش ئارەزوويەكی رەگەزی حەرامە . |
| عقدية، شجرة العقد | Ormosia | دارملوانكە، درەختێكە بۆ رازاندنەوەيە ، بەرەكەی خڕە ملوانكەی لێدروست دەكرێت. |
| عقدية، مكورة عقدية، باكتريا عقدية أو سبحية | Streptococcus | باكتریای گرێیی، باكتریایەكە شێوەكەی خڕە وەكو تەزبیح كۆمەڵ دەبێت . |
| عقدة، ميل بحري | Sea-mile, Knot, Nautical mile | گرێ، میلی دەریایی، یەكەی پێوانی خێرایی لە دەریادا دەكاتە هەزار و هەشت سەد و پەنجا و دوو مەتر. |
| عقداء | | بروانە ( خاتم سليمان، نبات). |
| عقدة، إنج، بوصة | Inch | گرێ، ئینج، ٢,٥٤سم . |
| عقدة ، لغز | Puzzle, Problem | مەتەڵ. |
| عقدة القصب، عُقلة | Joint | گرێی قەدی رووەكی قامیش. |

| | | |
|---|---|---|
| عقدة اوديب | Odypus-complex, Oedipus-complex | گرێی ئۆدیب، داستانێکی پڕوپووچە، گوایا لاوێکی لادێیەک باوکی ئەکوژێ و دایکی خۆی دەهێنێت . |
| عقدة في خشب | Knot, Knur | گرێی دار، گرێی تەختە . |
| عقد الخرز، قلادة الخرز | Chaplet | لیزگە، ملوانکەی موورو. |
| عقدة خنازيرية، سلعة خنازيري، داء الملك | Scrofula, | نەخۆشی شا، سیلی لوولیمفاوییەکان و بە تایبەتی لە ملدا |
| عقدة لمفية | Lymph nodule | گرێی لیمف، لوویەکی لیمفاوی بچووک و ساکارە. |
| عقدة رانڤير | Node of ranvier | گرێی ڕانڤیر، ئەو گرێیەی کە لەناو ڕیشاڵە دەمارییەکاندا هەیە، ئەو تەسکاییە کە لە کالانی ڕیشاڵی دەماریدا هەیە. |
| عقدة كلومر، كبيبة | Glomerulus, Glomerule | گرێیگلۆمەر، تۆپەڵێك لە بۆری خوێن لە گورچیلەدا . |
| عقدة عصبية | Ganglion, Neuroploca, Neuroganglion | گرێی دەماریی . |
| عقدة نفسية، مركب نفسي | Complex | گرێی دەروون. |
| عُقر، عقم | Barrennes, Sterility | نەزۆکی، بێبەریی، وەجاخ کوێری، بەیچەڵی. |
| عقرب، قصحل | Scorpion | دووپشك، چزوپێلە، کەژدم، کولەنجێ، کولاژدم. |
| عقرب | Scorpius | دووپشکە، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| عقرب البحر، جلاّخ | Scorpion fish, Scorpaena | ماسییە دووپشکی، ماسییەکی سەرزل دڕکاوی ژەهرینە |
| عقرباء، عقربة | Scorpion (female) | دووپشکی مێ. |
| عقربان | Scorpion (male) | دووپشکی نێر. |
| عقربان، كفّ النسر | Scolopendrium officinale | لەپی سیسارك، زمانە ئاسك، گیاکرمی، جۆرێکە لە ڕووەکی کەروزە کێویلە، لقەکەی باریك و درێژە . |
| عقربية، ذنب العقرب | tail, Caterpillar plant, Scorpiurus | کلکە دووپشك، چزووە دووپشك، جۆرە گیایەکە گوڵی زەرد دەگرێت بەرەکەی باڵێکی کەوانەیی پێوەیە لە چزووی دووپشك دەچێت. |
| عقربيات | Scorpionida | دووپشکییەکان،کۆمەڵە گیاندارێکە دووپشك و جاڵجاڵۆکە دەگرێتەوە . |
| عقربية | Buthus | جۆرێکی ترسناکە لە دووپشك، شێوەکەی سێگۆشەیە. |
| عقرب اصفر، شبوة، شباه | Yellow scorpion | دووپشکی زەرد. |
| عقرب سوطي | Whip scorpion | دووپشکی قامچیدار، گیاندارێکی جومگەدارە. |
| عقرب كاذب | Pseudo scorpion | دووپشکە درۆزنە.<br>١. گیاندارێکی جومگەدارە لە دووپشك دەچێت کلکی نییە.<br>٢. جۆرێکە لە جاڵجاڵۆکە . |
| عقرب الهواء | Solpugidae, Solifugae | سۆلفیوجی، دووپشکی هەوا ، گیاندارێکە لە جاڵجاڵۆکەی گەورە دەچێت لەشی تووکنە . |
| عقرب الماء | Nepidae, Nepa, Water scorpion, Scorpion bug | دووپشکی ئاویی، جاڵجاڵۆکەی ئاویی، جۆرە مێروویەکی درێژکۆڵەیە لە ئاودا دژەی، کلکەکەی وەك چزوو وایە بۆشە هەناسەی پێدەدات . |
| عقرب الساعة | Hour-hand | میلی سەعات، میلی کاتژمێر، پیشاندەری سەعات. |
| عقصة الشعر | Braid, Plait | تیتك، ئەگریجە، بسك. |
| عقص الشعر | Tobraid, Toplait | قژلوول کردن . |
| عقصي، بيدق | Cast-net | جۆرە واشەیەکی گەنم ڕەنگە. |

| | | |
|---|---|---|
| عقعق، كندش | Magpie | قشقرە، قاژو، قاژك، زاخی ، قەلەباچكە، بودینە، قەجەلە، قەلەبازەڵە، قەلە ڕەشێكی بەڵەكە،كلكی درێژە، قەلەباچكە خومەڕێژە. |
| عقف، عقفاء | Orixa | ڕووەكێكە لە كۆمەڵەی سەداو، بەرەكەی چەماوەیە، گوڵەكەی سوور یان زەردە، گەڵاكەی مادەیەكی ژەهری تیایە ئەگەر ئاژەڵ بیخوات دەمرێت . |
| عقّ | Trench | دوكان، شەتڵگە، شوێنێك بۆ ڕوواندنی ڕووەك. |
| عقل | Intelligence, Sanity, Mind | ژیریی ( ئەقڵ)، بیر، هۆش، ئاوەر. |
| عقلي | Intellectual, Mental | ژیریی ، شتێك پەیوەندی بە ژیرییەوە هەبێت. |
| عقلية، ذهنية | Mentality | ژیریی، زیرەكی . |
| عقلة، فسيل، قلم، ينساب، ينقضي | Cutting, Slip, Joint | قەڵەمی ڕووەك كە بۆ زیادكردن بەكاردێت، شاخەپێوەن. |
| عقلة | Metamere, Segment | پارچە، پارچەیەك لە لەشی هەندێك گیاندار وەكو لە كرمی زەویدا . |
| عقل باطني، عقل لاواعي | The unconscious | ژیریی ناوەكی . |
| عقل الكتروني، دماغ الكتروني | Electronic-Brain, Computer | كۆمپیوتەر، مێشكی ئەلیكترۆنی، دەزگایەكی ئاڵۆزە كردارەكانی بیرو هۆش دەگۆڕێت بۆ چەند نیشانەیەك و ڕێكیان دەخات بۆ ئەوەی خێرا بگاتە ئەنجامێكی ئەوتۆ كە مێشكی ئادەمیزاد لە توانایدا نییە بەو خێراییە بیگاتێ. |
| عقم | Sterility, infertility | نەزۆكی، وەجاخ كوێریی. |
| عقم الرجال | Sterility | وەجاخ كوێری بە هۆی نەتوانین گون لە دروستكردنی ئاودا و یان نەگەیشتنی ئاوەكە بە چووك و یان سپێرمەكانی ئاوەكە لاواز بێت. |
| عقم النساء، عدم الحمل، عقر | Nullioarity, Acyesis, nulliparity, Atocia, Barrenness | نەزۆكی، بەیچەڵی، نەبوونی منالْ بە هۆی پووكانەوەی كۆئەندامی زاووزێ یاخود نەخۆشی لووی كەڕ( لووەكوێرە) و هێلكەدان و ملی میزدانەوە و نەخۆشی سووزەنەك. |
| عقوبة | Punishment | سزا. |
| عقوة | Correa | كۆریا، ڕووەكێكی دەشتەكییە ، قەدەكەی توركنەو گوڵەكەی لە زۆرنا دەچێت ڕەنگی سپی و پەمەیی و سوورە. |
| عقور، عُضّاض | Biting | گەزندە، هەر زیندەوەرێك بگەزێت ، گاز بگرێت. |
| عقول، قابض | Astringent | دەرمانی گیری، دەرمانی كرژكەر، هەر دەرمانێك شانەكانی لەش گیر واتە كرژ بكات دژی دەردان و خوێن بەربوون. |
| عِقي | Meconium | مارەزا، شتێكی ڕەشی لینجە لەناوسكی منالی ساواوە دێتە دەرەوە دوای لە دایكبوونی و بەر لەوەی كە دەست بكات بە شیر خواردن یان دوای یەكەم شیر خواردن . |
| عقيب، فرخ العقاب | Eaglet | بەچكە دالْ. |
| عُقَيب، مُرزة، صقر حَوام | Harrier, Circus, Buzzard | جۆرێكە لە هەڵۆ زۆر گەورەیە، دەنووكی گەورەیە زۆر بەرز دەبێتەوە لە فڕیندا ، هەندێكیان گۆشتی زیندوو و هەندێكیان گۆشتی گیانەوەری مردوو دەخۆن . |
| عقيدة | Nodule | گرێۆكە، گرێیەكی بچووك. |
| عقيد هندي، هرد، كركم صباغي، اصابع صفر | Turmeric curcuma, Zedoary | زەردەچەوە، ڕووەكێكی پزیشكی سەلكدارە ، لە كۆمەڵەی زەنجەفیلە، هاڕاوەی ڕەگەكەی بە شێوەی بەهارات ، هەروەها بۆ ڕەنگكردن بە زەرد بەكاردەهێنرێت . |
| عقيص، صقلاب معقوص | Asclepias contorta | ڕووەكێكە لە كۆمەڵەی دوو لەتكەییەكان. |

| | | |
|---|---|---|
| عقيصة، ضفيرة | Braid, Plait | پرچ، بوكلە، بوكلەی قژ. |
| عقبان | Native gold | زێڕی پەتی، زێڕی خالیسە، ئاڵتونی تیزاب . |
| عقيم | Barren, Nullipara, Childless, Effete, Sterile | نەزۆك، بەیچەڵ، وەجاخ كوێر. |
| عقيم، عديم الثمرة | Fruitless | نزر، بێبەر. |
| عقيق | | گیایەكی هندییە بۆ دەرمان بەكاردێت . |
| عقيق | Agate | ئاگەیت، حەفتم، یاقیق، ئاقیق، بەردێكی جوانی بەنرخە، جۆرێكە لە كوارتز ( سلیكا) هەندێك ئۆكسیدی ئاسنی تێدایە، ڕەنگی خۆڵەمێشی زەرد یان سوور یان شینە بە شێوەی بەردی بەنرخ یان لە دروستكردنی ئامرازی زانستیدا بەكاردێت. |
| عقيق ابيض، خلقيدوني، كالسيدوني | White agate, Chalcedoriy | یاقیقی سپی، كەرەسەریەكی خاوە لە كۆمەڵەی سلیكای بلوور ورد لە پێكهاتندا بریتییە لە دووەم ئۆكسیدی سلیكۆن واتە كوارتز، بەردێكی بەنرخە. |
| عقيق احمر، جارنيت | Garnet, Cornelian, Carnelian | جارنیت، یاقیقی سوور، بەردێكی بەنرخە، ڕەنگەكەی لە نێوان زەرد و سوور و قاوەییدایە، كەرەسەیەكی خاوە كالسیۆم و ئاسن و مەگنسیۆم و مەنگەنیز و ئەلەمنیۆم و كرۆمی تیادایە . |
| عقيق احمر، صرد | Sard | ( سارد): یاقیقی سوور. |
| عقيق يماني، جزع | Onyx | یاقیقی یەمانی، سلەیمانی، جۆرێكی نایابە لە یاقیق، هێڵی تەریبی سپی یان قاوەیی یان ڕەش یان سوور یان خۆڵەمێشی تیادایە، بریتییە لە چەند جۆرێك لە سلیكا . |
| عقيق مُجزّع، عقيق مُشطبّ | Sardonyx | ساردۆنیكس ، یاقیقی هێڵدار جۆرێكە لە یاقیق، هێڵی سپی و قاوەیی تێدایە . |
| عقيق اسود | Melanite | یاقیقی ڕەش، ( میلانیت). |
| عقيرة، صوت | Voice | دەنگ. |
| عَكّ، عكيك | Hot day | گەرمایی بەتین بە هۆی نەجمانی هەواوە . |
| عكابية | Spider-wort | گیا جاڵجاڵۆكە، گیایەكی ڕازاندنەوەیە ، گوڵی سپی دەگرێت. |
| عكام، صُرة | Wrapper, Bursa, Sack, Bundle | بوخچە. |
| عُكاس | Spider (male) | نێرە جاڵجاڵۆكە. |
| عُكاشة | Spider work, Cobweb | هێلانەی جاڵجاڵۆكە، تەناف شەیتان . |
| عكازة، عصا | Staff, Crutch | گۆچان، دارشەق، گۆپاڵ. |
| عكارة، عكرة | Sidement-dregs, Turbidity | لیڵی، لیخنی . |
| عكب، برطمة، غلظ الشفتين | Macrochilia | لچ ئەستووریی . |
| عِكبر | Bee wax, Propolis | مێوی هەنگوین، زەمقێكی ڕاتنجییە، هەنگ لە هەندێك درەختی وەكو بیكۆی دەكاتەوە و شانەكەی پێ جێگیر دەكات . |
| عكبر، فارة الغيط، فارة الحقول | Fieldmouse, Vole | مشكی كێڵگە . |
| عُكة | Oil skin, Skin for fat | هیزەی ڕۆن. |
| عكرة | | بروانە ( عكارە) . |
| عكر، الطراز العرقي | Turbid, Muddy | لێڵ، لیخن، شێلی، شێلو. |

| | | |
|---|---|---|
| عكر، كمأة الماء | Water caltrops, Water chestnut | كەستانەی ئاو، جۆرە گیایەكی ئاویی سەلكدارە، بەرەكەی لە گوێز دەچێت . |
| عكِر | Genotype | جینۆتێپ، كاری جین بەسەر سیفەتی زكماكیدا . |
| عكريش، عكرش، نجيل، نجم | Fesue grass, Couch grass, Yuake grass, Wheat grass, Dog grass, False wheat | جۆرە گیایەكە لە كۆمەڵەی دەغلودان بۆ لەوەڕ باشە، لە زەویدا ڕەگ و قەد بڵاودەكاتەوە بە زەحمەت هەڵدەكێشرێت |
| عكرشة، ارنبة، خزنق ، انثى الأرنب | Doe-rabbit | كەروێشكی مێ. |
| عكرمة | Pigeon (female) | كۆتری مێ. |
| عكس | Inversion, Reversal | پێچەوانە، چەواشە، بەدەوائی، دژ، رك. |
| عكس، قلب | Reversal | هەڵگێڕانەوە. |
| عكس، ترقيد النبات | Layer | قاشووكردن، ڕێگەیەكە بۆ زیادكردنی ڕووەك وەكو لە مێو (ڕەز)دا . |
| عكسي | Reciprocal, Reverse | پێچەوانەیی. |
| عكوة | Pit of the chin | چاڵی چەناگە. |
| عكوب، كعوب، كعيب | Gundelia, Milk thistle | كنگر، قنگر، ڕووەكێكی دڕكاوییە، ڕەگەكەی بەهێزە گوڵەكەی مەیلەو زەردە، بنكێكی هەیە لە ژێر زەویدا دەردەهێنرێت و دەخورێت یان دەكرێت بە چێشت. . |
| عكيس، ترقيدة | Layer of avine | لقی دارمێو، لقی داری مێو كە دەخرێتە ژێر زەوییەوە بۆ مەبەستی زیادكردن و دروستكردنی ڕەز. |
| علّ، حَلَمْ | Sar coptes, Demodex | سپ، زپ، ئەسپێی بەر، چنگنە، پن، مێروویەكی بچووك و زیان بەخشە لە ژێر پێستدا دەژی و دەبێتە هۆی گەڕی . |
| علاط | Lateral face | لامل، ڕووی مل لەلاوە. |
| علاج، معالجة، دواء، مداواة | Treatment, Remedy, Cure, Medical treatment | چارەكردن، چارەكردنی نەخۆشی بە ڕێگەی پزیشكی . |
| علابة | Empacking (machine) | مەكینەی قوتوكردن، مەكینەی شت خستنە قوتووە. |
| علاج بالاشعة | Radiotherapy | چارەكردن بە تیشك، وەكو چارەكردنی هەندێك نەخۆشی بە تیشكی سەروو بنەوشەیی یان تیشكی سینی ( تشكی ئێكس) یان گاما. |
| علاج بالكهرباء | Electropathy | چارەكردنی نەخۆشی بە كارەبا . |
| علاج كيميائي | Chemotherapy | چارەكردنی كیمیایی، چارەكردنی نەخۆشی بە دەرمان . |
| علاج طبيعي | Naturopathy | چارەكردنی سروشتیانە، جۆرێكن لە چارەكردنی نەخۆشی دەرمانی تێدا بەكارناهێنرێت بەڵكو كارە سروشتییەكانی وەكو ئاو و هەواو خۆر و گەرمی و شێلان هتد. |
| علاجي | Therapeutic | شتێك پەیوەندی هەبێت بە چارەكردنی نەخۆشییەوە. |
| علاج بالانفاذ الحراري | Diathermy | چارەكردنی نەخۆشی بە تێپەڕكردنی گەرمی . |
| علاج نفسي | Psychotherapy | چارەكردنی دەروونی، چارەكردنی پشێوی ژێری و دەماری بە ڕێگەی دەروونی . |
| علاج غذائي | Diet cure | چارەكردن بە پارێز، چارەكردن بە خواردەمەنی. |
| علاة ، سندان | Anvil | دەزگا، دەزگای ئاسنگەر. |
| علافّ | Seller of provender | دەغڵ فرۆش، عەلاف. |

| | | |
|---|---|---|
| علاقة، صلة | Relation, Connection | پەیوەندی |
| علاقة، عنق، سويق | Petiole | لاسکۆکە، لاسکی گەڵا. |
| علاقة، حبل التعليق | Suspension-rope | تەناف، تەناڵی جل هەڵخستن . |
| علاقة الثياب | Costume-hanger | هەپە، عەلاگەی جل . |
| علاقة رياضية | Mathematical relation | پەیوەندی بیرکاریی. |
| علاقة طردية، تناسب طردي | Direct-proportion | پەیوەندی ڕاستەوخۆیی، هلوڕێژەی ڕاستەوانە. |
| علاقة عكسية، تناسب عكسي | Inverse-Variation, Inverse proportion | پەیوەندی پێچەوانەیی، هاوڕێژەی پێچەوانە. |
| علاقة متبادلة | Reciprocal-relation | پەیوەندی ئاڵوگۆڕکردن. |
| علاك، حُبض | Pittosporum, Chesse weed | گیاپەنیرە، ڕووەکێکی دوو لەتکی‌یە، گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویەکی جوانی بۆن خۆشە. |
| علامة | Well informed | زانای بلیمەت، زۆرزان، پیتۆڵ، هۆزان. |
| علامة، سمة، وشم | Token, Mark, Sign | نیشانە، ڕینما، دروٚف، هێما. |
| علامة ، طحين ناعم | Fine flour | وردە ئاسن . |
| علامة الجذر | Radical sign | نیشانەی ڕەگ. |
| علامة مساحية، صوة | Bench mark | ئەو نیشانەیەیە کە لەسەر زەویدا دادەنرێت لە کاتی پێواندا. |
| علامة تجارية | Trade mark | مارکەی بازرگانی، مۆری بازرگانی . |
| علامة سالبة | Negative-sign | نیشانەی نەگەتیڤ ( − ) ، نیشانەی نایەتی (سالیب). |
| علامة موجبة | Positive-sign | نیشانەی پۆزەتیڤ (+) ،نیشانەی ئایەتی (موجەب). |
| علامة القبر، شاهدة القبر | Tomb stone, Grave stone | نیشانیە گۆڕ، کێل. |
| علامةالطريق | Mark | قۆچ، کێلەڕێ. |
| علانية | Openness, Publicity, Openly | ئاشکرا، بە ئاشکرا. |
| علاوة، زيادة | Increase, Addition, Extra, Increment | سەربار، زیادە. |
| علاوة راتب | Rise (in salary) | سەرمووچە. |
| علاوة العيار | Into the bargain | سەرسنگ، سەڵاوانە، ئەو زیادەیەی کە دەخرێتە سەر پشتی کێشراو و فرۆشراو بە خۆڕایی ( خاترانە ). |
| علاوة الحمل | Over load | سەربار، چەمپال. |
| علاّم، طوط، باشق | Sparrow-hawk | واشە، هەڵۆی چۆلەکە، ڕەنگەکەی بۆرە. |
| عُلبة | Can | قوتوو، قۆدی، گەروانك. |
| علبة، صندوق | Box | سنوق . |
| علبة الثمرة | Capsule, Pyxidium | دلیق، قۆزە، بەرموانك، بەرێکی وشکە لە شێوەی قۆزاخەدایە، تۆوی تیایە لە کاتی پێگەییندا لە خۆیەوە دەکرێتەوە . |
| علبة الاثقال، علبة عيارات | Weight case | قوتووی سەنگ، ئەو قوتووەی کە سەنگی تێدەکرێت وەکو کیلۆ و نیوکیلۆ هتد. |
| علبة السكاير | Cigarette-case, Cigarctte-box | پاکەتی جگەرە، قوتووی جگەرە. |
| علبة المربى | Fruit jar | قوتووی مرەبا، قوتووی ڕەچاڵ. |

| | | |
|---|---|---|
| علبة كبريت | Box of Matches | قوتووی شقارته. |
| علبة مقوى | Box from carton | پاكەت. |
| علبة معدنية، علبة صفيح | Can, Tin | قوتووی كانزایی. |
| عُلِب، جهبل | Bongo, Tragelaphus | بۆنگۆ، جۆرە ئاسكێكە ڕەنگەكەی شیٚیە، هێڵی سپی و زەردی تێدا یە . |
| علبط | Flock (of sheep) | گەلەمەڕ، ڕانەمەڕ، مێگەل. |
| علة، مرض | Disease, Illness, Nosema | نەخۆشی ، دەرد. |
| علة عصبية | Neuropathy | نەخۆشی دەماریی . |
| علة، سبب | Reason, Cause | هۆ. |
| علثّ، خندريلي | Cichoium-Divaricatum, Chondrilla | گیایەكی دەشتەكی‌یە لە كۆمەڵەی تاڵیشك. |
| علج، علجان، خيزران | Bamboo | حەیزەران، ڕووەكێكە لە قامیش دەچێت ، لقەكەی دەكرێت بە داردەست، هەروەها لە دروستكردنی خانووشدا بەكاردێت . |
| علج، حمار وحشي | Onager | كەرەكێوی. |
| عُلجوم، عُلجمُ، ضفدع الجبل، ضفدع السم، ضفدع الطين | Toad, Bufo | نێرەبۆق، بۆقی ژەهراویی، بۆقە كێوی، بۆقی قوڕ. |
| علجوم اقرن | Horned-toad | بۆقی شاخدار، مارمێلكەیەكی ئەمریكی بچووكی پانكەڵەی دڕكاوی شاخدارە. |
| علدْ، عنب البحر | Epherdra, Sand cherry, Seagrape, grape-sea | ترێی دەریا، جۆرە دەوەنێكە بەرەكەی ڕووتە و گوڵی نێر و گوڵی مێ دەگرێت ، بەرەكەی لە ترێ دەچێت وورد و ترشە دەخورێت و هەندێك سوودی پزیشكی تێدایە . |
| عُلدي الدباغين | | ئەفیداری دەباخكردن، دەوەنێكە دەرمانی ئەفیدرینی لێدەردەهێنرێت . |
| علس، سِفَ | Cephus | سیفەس، مێروویەكی زیان بەخشە بە ڕووەك بە تایبەتی داری مێو، لە زەردەزیرە دەچێت . |
| علسط، ميزان الارتفاع | Altimeter | بەرزی‌پێو، ئامرازی پێوانی بەرزی لە ڕووی زەوی‌یەوە. |
| علس، خندروس | Spelt, Speltz | جۆرێكە لە گەنم بۆ بەرهەم هێنانی جۆری تازە لە گەنم بەكاردێت. |
| علس، قراد | Tick | گەنە، مێروویەكی زیان بەخشە . |
| علعال | Phalaropus | باڵندەیەكە ڕەنگەكەی قاوەیی مەیلە و سوورە، ژێر ملی سپی‌یە و باڵی ڕەشە. |
| عُلعُل، حُمرة | Calandra-lark | جۆرە كلاوكوڕەیەكی گەورەیە، پشتی قاوەیی و ژێرسكی سپی‌یە، دەنووكی قاوەیی مەیلەو زەردە . |
| علعلان | Tapiscia | درەختێكی ڕازاندنەوەیە ، گوڵەكەی بە شێوەی هێشووی زەردە . |
| علف، عليق، علوفة | Aliment of cattle, Fodder, Feed, Forage, Provender | ئالیك، پاوەن، ئاڵف، گزرە. |
| علف الدقيق الاحمر | Wheat red dog | جۆرێكە لە ئالیكی ئاژەڵ لە كەپەكی ئارد دروست دەكرێت، پرۆتینی زۆری تیادایە . |
| علف المطمورة، علف محفوظ | Silage | ئالیكی پارێزراو، ئالیكی هەڵگیراو، جۆرێكە لە ئالیك بە سەوزی وشك دەكرێتەوە و بە داپۆشراوی لە ژێر زەوی یان سەر زەوییدا هەڵدەگیرێت . |
| علف هريس، عجين للطيور، علف الدواجن | Mash (for poultry) | دان، ئالیكی پەلەوەر، جۆرە دانێكە ( ئالیك) وەكوهەویر بریتی‌یە لە تێكەڵاوی ئارد و گیای جنراو یان گۆشتی جنراو و ووردەنان یان تلپەی ڕووەك و پەتاتە و خوێن دەدرێت بە باڵندە. |

| | | |
|---|---|---|
| علفية، برومس | Brome grass, Bromus | برۆمەس، ڕووەكێكە لە كۆمەڵەی دەغڵودان بۆ لەوەڕ باشە. |
| علق، علقة، علق طبي، دود رومي | Leach, Hirudo | زەروو، جۆرە كرمێكی ئەڵقەی‌یە، مژۆكێكی هەیە، دەنوسێت بە لەشی مرۆڤ و گیاندارەوە خوێنەكەیان هەڵدەمژێت بە هەڵە بەكاری دەهێنن بۆ مژینی خوێنی مرۆڤ ، زیڕی ، زەلوو، زوورگ، زوری، زیلوو، زێروو زالوو. |
| عِلق، نفيس | Precious | بەنرخ، نایاب. |
| علقة | Segment | پارچە. |
| علقة، ترويقة | Breakfast | بەرقلیان، ناشتا. |
| علقي | Osyrisalba | جۆرە درەختێكە |
| علقم، حنظل، مُرّ الصحاري، قثاء الحمار، شري | Colocynth, Bittercucumber, Bitter apple | زەرەند، كوزارك، ژووژاڵك، كوژاڵك، كاڵەكە مارانە، تاڵكە |
| علقم، مُرّ | Bitter | تاڵ، زلندار. |
| عَلك | Chewing, Mastication | جوون، جوونی بنێشت. |
| عِلك رومي | Roman-mastic | بنێشتی مەستەكی، زەمقێكی ( بنێشتێكی) زەردە، درەختی مەستەكی كە جۆرێكە لە قەزوان دەریدەدات، دەكرێتە مەیەوە . |
| عِلك | Mastic, chewing gum | بنێشت، شیراوێكە لە داری قەزوان دەردەهێنرێت و لە پێشدا تاڵە بە كوڵاندن خۆش دەكرێت و دەكرێتە تورەكەی خامەوە بۆ گەلێك مەبەست بەكاردێت . |
| علك مُصفى | Clarified-mastic | بنێشتە خۆشە . |
| علك مر | Bitter mastic | بنێشتە تاڵ، شیراوێكە لە داری قەزوان دەردەهێنرێت. |
| علك الغزال | | كاردوو، هان، ڕووەكی هەزار گەڵا |
| علّ | Crab-louse | چنگنە، ئەسپێی بەر. |
| علَم | Banner, Flag | بەیاخ، بەیداخ، ئاڵا. |
| علم | Knowledge, Science | زانست، زانین. |
| علمي | Scientific | زانستی‌یانە |
| علم الآثار القديمة | Archaeology, Archelogy | زانستی ئاسەوارە دێرینەكان، ئاسەوارناسی. |
| علم أمراض النساء | Gynecology | زانستی نەخۆشی‌یەكانی ژنان. |
| علم نشوء الأعراق | Ethnogeny | زانستی پەیدابوونی ڕەگەكانی ئادەمیزاد، ڕەگناسی. |
| علم الجنس | Sexology | زانستی ڕەگەز، ڕەگەزناسی. |
| علم الرطوبة، علم قياس الرطوبة | Hygrometry | زانستی شێ، شێناسی، زانستی خوێندنی هەڵمی ئاو و ڕەفتارەكانی لە هەوادا . |
| علم أسباب الأمراض | Etiology, Aetiology | زانستی هۆی نەخۆشی‌یەكان . |
| علم الأحياء، علم الحياة | Biology | بایۆلۆجی، زانستی زیندەوەرەكان، زیندەوەرناسی. |
| علم التربة | Pedology | زانستی خاك، خاكناسی. |
| علم دراسة الأطفال | Pedology | زانستی خوێندنی ژیان و گەشەكردنی منداڵان، منداڵناسی. |
| علم تصنيف الأمراض | Nosology | زانستی پۆلكردنی نەخۆشی‌یەكان. |
| علم الأجنة | Embryology , Cyemology | زانستی كۆرپەلە، كۆرپەلەناسی، چونكە وشەی( ئیمبریۆن) بە یۆنانی كۆرپەلە دەگرێتەوە. |
| علم التخدير | Anesthesiology | زانستی سڕكردن، زانستی بێ‌هۆشكردن. |

| | | |
|---|---|---|
| علم اثار الأقدام المتحجرة | Ichnology | زانستی شوێنی پێی بووبەبەردەکان . |
| علم الحشرات | Entomology | زانستی مێرووەکان، مێرووناسی، چونکە لە زمانی یۆنانیدا بە مێروو دەڵێن ( ئێنتۆمۆن). |
| علم الإلكترونيات الضوئية | Photo electronics | زانستی ئەلیکترۆنییەکانی ڕووناکی . |
| علم الجماجم | Craniology | زانستی کەللەسەر، کەللەسەرناسی. |
| علم الاجتماع | Sociology | زانستی کۆمەڵایەتی ، کۆمەڵناسی. |
| علم الأنساب | Genealogy | زانستی ڕەچەڵەك، ڕەچەڵەکناسی. |
| علم الاقتصاد | Economics | زانستی ئابووری، ئابووریناسی. |
| علم الأنسجة | Histology | زانستی شانەکانی لەش، شانەناسی. |
| علم الأمراض النباتية، الباثولوجيا النباتية، علم الوصامة | Phyto-pathology | زانستی نەخۆشییەکانی ڕووەك، زانستێکی تازەیە باسی ئەو نەخۆشیانە دەکات کە تووشی ڕووەك دەبن و و هۆکان و نیشانەکانیان و چۆنیەتی بەرهەڵستیکردنیان . |
| علم أمراض النفس | Psychiatrics, Psychiatry, Psycho-pathology | زانستی نەخۆشییەکانی دەروون. |
| علم الظواهر | Phenomenology | زانستی دیاردەکان، دیاردەناسی، زانستێکە باسی ئەو دیاردانە دەکات کە لە سروشتدا ڕوودەدەن . |
| علم الأمصال | Serology | ( سیرۆلۆجی)، زانستی زەرداوەکان، زەرداوناسی، زانستی دەرمانی کوتان، خوێندنی سروشتی تەنە دژەوەرەکان و پەیوەندیان بە یەکترییەوە. |
| علم التطبيقات الجراحية | Acidology | زانستی کارپێکردنە نەشتەرگەرییەکان . |
| علم تقويم الأسنان | Orthodontics, Orthodontology | زانستی ڕاستکردنەوەی ددانە خوارەکان . |
| علم الأمراض | Pathology | زانستی نەخۆشییەکان، نەخۆشیناسی. |
| علم الألوان، اللونيات | Chromatics | زانستی ڕەنگەکان، ڕەنگناسی. |
| علم الإحصاء، إحصائيات | Statistics | زانستی ئامار، ئامارناسی. |
| علم الأحوال المدنية، علم دراسة السكان | Demography | دیمۆگرافی، زانستی باری شارستانێتی، خوێندنی دانیشتوانی وڵاتێك دەربارەی زان و مردن و تەندروستی و ژنهێنان هتد. |
| علم البناء، فنّ العمارة | Architecture, Architectonic | زانستی ساختمان، هونەری ساختمان، ساختمانناسی، هونەری کۆشك و تەلار بیناکردن، زانستی بەنایی. |
| علم الأشعة | Radiology | تیشکناسی، زانستی تیشك، بەکارهێنانی تیشك بۆ دۆزینەوە و چارەکردنی نەخۆشی. |
| علم الادوية ، علم الصيدلية، علم العقاقير | Pharmacology | زانستی دەرمان ، زانستی دەرمانگەریی، زانستی ئەجزاچێتی، دەرمانناسی. |
| علم الأحياء الإشعاعي | Radiobiology | زانستی زیندەگی تیشکیانە، جۆرێکە لە زانستی زیندەوەر باسی کارلێکردنی نێوان مادە تیشکدەرەوەکان و لەشی زیندەوەر دەکات ( رادیۆبایۆلۆجی). |
| علم الأصوات الموسيقية | Harmonics | زانستی دەنگە مۆسیقییەکان. |
| علم الأحياء الابتدائية | Protozoology | زانستی زیندەوەرە سەرەتاییەکان ، واتە یەکخانەییەکان . |
| علم الأسماك | Ichthyology | زانستی ماسییەکان، چونکە ( ئیچتیس) بە زمانی یۆنانی ماسییە، ماسیناسی. |

| | | |
|---|---|---|
| علم الأرصاد الجوية، علم الأنواء الجوية، علم الظاهر الجوية | Metreorology | ميتيۆرۆلۆجی، كەشەوانی، زانستی كەش، كەشناسی، زانستی بارەكانی كەش، زانستی چینەكانی هەواو باری كەش و ئاووهەوا لە ڕووی گەرمی و پاڵەپەستۆی هەواو ڕێڕەوی با و هەور، زانستی تێڕوانینی بارەكانی كەش. |
| علم المناعة | Immunology | زانستی بەرگەگری، ( دژی نەخۆشی)، بەرگریناسی. |
| علم الأمراض الحيوانية | Zoopathology | زانستی نەخۆشی گیانەوەری. |
| علم البيئة | Ecology, Mesology | ئیكۆلۆجی، زانستی ژینگە، ژینگەناسی. |
| علم البيئة النباتية | Phytoecology | زانستی ژینگەی ڕووەك، ژینگەناسی ڕووەك. |
| علم البيئة الحيوانية | Zoo-ecology | زانستی ژینگەی گیاندار، ژینگەناسی گیاندار. |
| علم البكتريا، علم الجراثيم | Bactriology | زانستی باكتریا، زانستی میكرۆب، (باكتریۆلۆجی). |
| علم البستنة | Horticulture | زانستی باخچە، زانستی بێستان، باخچەناسی. |
| علم أصول التدريس | Pedagogy | زانستی چۆنیەتی دەرس گوتنەوە، دەرسدانناسی. |
| علم البصريات، بصريات | Optics | زانستی بینایی، زانستی بینین، باسی یاساكانی ڕووناكی بینین دەكات، بیناییناسی. |
| علم البصريات الهندسية | Geometrical optics | زانستی بینایی ئەندازەیی. |
| علم البلورات | Crystallography | زانستی كریستاڵ، زانستی بلوور، بلوورناسی. |
| علم توازن السوائل | Hydrostatics | زانستی هاوسەنگی شلەكان . |
| علم اللبائن، علم الثديات | Mammalogy | زانستی شیردەرەكان، زانستی مەمكدارەكان، شیردەرناسی. |
| علم توازن الهواء | Aerostatics | ئێرۆستاتیكس، زانستی هاوسەنگی هەوا. |
| علم التشريح | Anatomy | ئەناتۆمی، زانستی تۆێكاری، تۆێكارناسی. |
| علم التشريح المقارن | Comparative-anatomy | زانستی توێكاریی بەراورد، خوێندنی لەیەكچوون و جیاوازی لە نێوان گیاندارەكاندا لە ڕووی یەكالاكردنەوە و توێكارییەوە. |
| علم البراكين | Volcanology | زانستی گڕكان، زانستی گڕكان، گڕكانناسی، گڕكاناسی لقێكە لە جیۆلۆجی لە دیاردە گڕكانییەكانی دەكۆڵێتەوە. |
| علم التصنيف | Taxonomy | زانستی پۆلێنكردن، زانستی پۆل پۆل كردن، پۆلێنناسی. |
| علم الجغرافية | Geography | جوگرافیا |
| علم الجغرافية الحيوانية | Zoo geography | جوگرافیای گیاندار، دابەشبوونی گانەوەر لە ڕووی جوگرافیاوە. |
| علم الجراحة | Surgery | زانستی نەشتەرگەری، نەشتەرگەریناسی. |
| علم ما وراء الطبيعة، علم الميتافيزيقا، علم المعقولات | Metaphysics | میتافیزیك، زانستی ئەودیوی سروشت، زانستی نهێنییەكانی سروشت . |
| علم الحيوان | Zoology | زانستی گیاندار، گیانەوەرناسی. |
| علم الحيوان الاقتصادي | Economic zoology | زانستی ئابووری گیاندار . |
| علم نشوء الأرض | Geogeny, Geogony | زانستی پەیدابوونی خڕۆكی زەوی، زانستی پێكهاتنی دەرەوە و ناوەوەی زەوی. |
| علم الحساب | Arithmetics | زانستی ژمارە، زانستی ژماردن، ژمێرناسی. |
| علم تطبيقي، علم تكنيكي | Applied-science-technic<br>Technical seience | زانستی كارپێكردن، بەكارهێنانی زانستی هونەر لە بواری كاركردندا. |
| علم صرف، علم بحت | Pure science | زانستی پەتی. |
| علم الحشائش، علم الأعشاب | Agrostology | زانستی گژوگیا، گیاناسی، گیازانی. |

| | | |
|---|---|---|
| علم الحركة، علم ديناميكا | Dynamics | ديناميك، زانستی جووڵە، جووڵەناسی. |
| علم الحفريات، علم الركاز الحفرية، علم الآثار الحفرية، علم الاحاثة | Paleontology, Paleology | پاليۆنتۆلۆجی، زانستی بووبەردەكان، بووبەردناسی، زانستێكە باسی شێوەی ژيان دەكات لە سەدە جيۆلۆجی‌يە كۆنەكاندا لە ڕێگەی پاشماوە گياندار و ڕووەكە بووبەردەكانەوە ، ئەم وشەيەش لە ( پاليۆس) واتە كۆن و ( ئۆنتا) واتە دەبێت و ( لۆجی) واتەزانستی پێكهاتووە. |
| علم التطور، النشوء | Evolution | زانستی گۆڕان، زانستی گۆڕانی زيندەوەر، بە تايبەتی بەرەو گەشەكردن ، گۆڕانناسی. |
| علم الجغرافية الأقتصادية | Geonomics | زانستی جوگرافيای ئابووری. |
| علم التربة الزراعية | Agrology | زانستی خاكی كشتوكاڵی، زانستی خوێندنی ڕوو و پێكهاتنی زەوی لە پێناوی ڕاژەكردنيدا بە شێوەيەكی ئەوتۆ كە زۆرترين و چاكترين بەرهەمی كشتوكاڵی بدات . |
| علم الفيزياء الارضية، علم جيوفيزياء | Geophysics | جيۆفيزيك، زانستی فيزيايی زەوی، زانستی دەربارەی زەوی لە ڕووی فيزياوە. |
| علم التنجيم، علم النجوم | Astrology | ئەستێرەناسی، گوايا بە ديدەنی ئەستێرەكان و زانينی شوێنەكانيان دەتوانێت بەخت و چارەنووسی و دواڕۆژی مرۆڤ بزانێت . |
| علم قياس الاتحاد العنصري | Stoichiometry | زانستی پێوانی يەككگرتنی توخمی ، لقێكە لە زانستی كيميا باسی بڕی ئەو مادانە دەكات كە لە كارلێكی كيميايدا بەشداردەبن. |
| علم تفسير الأحلام | Oneirology | زانستی خەولێكدانەوە . |
| علم الحيات ، علم الأفاعي | Ophiology | زانستی مار، مارناسی. |
| علم الخمر | Oneology, Enology | زانستی مەی، مەيناسی. |
| علم الخطوط القديمة، بليوغرافيا | Paleography | زانستی خوێندنی نووسين و نەخشی كۆن. |
| علم الخيل، خيالة | Hippology | زانستی وڵاخ، زانستی ئەسپ، ئەسپناسی، وڵاخناسی. |
| علم الجبر | Algebra | زانستی جەبر، زانستی دۆزينەوەی ژمارەی نەزانراو بە هۆی پيت و ژمارەی زانراوەوە. |
| علم الأحياء النفسي، علم النفس الإحيائي | Psychobiology | زانستی زيندەگێتی دەروونی، لقێكە لە زيندەوەر، باسی پەيوەندی نێوان لەش و دەروون دەكات . |
| علم الشرايين | Arteriology | زانستی خوێنبەرەكان، خوێنبەرناسی. |
| علم الزلازل | Seismology | زانستی بوومەلەرزە، بوومەلەرزەناسی. |
| علم الزواحف | Herpetology, Erpetology | زانستی خشۆكەكان ، چونكە لە يۆنانيدا( ئێرپيتۆن) گياندارى خشۆك دەگرێتەوە ، خشۆكناسی. |
| علم الزراعة | Agronomy, Geopoics | زانستی كشتوكاڵ، كشتوكاڵناسی. |
| علم السموم | Toxicology | زانستی ژەهرەكان، خوێندنی سيفەت و كاری مادە ژەهرەكان، ژەهرناسی. |
| علم السمعيات | Acoustics | زانستی بيستن، بيستنناسی. |
| علم السلوك، علم سلوك الحيوان | Ethology | زانستی ڕەفتار، زانستی خوێندنی باری ژيان و خوورشەوشتی گياندارەكان ، ڕەفتارناسی. |
| علم الشكل، علم الهيئة | Morphology | زانستی شێوە، شێوەناسی، لە زانستی شێوە و پێكهاتنی گياندار و ڕووەك. |
| علم الأشعة الرونتكنية | Roentgenology | زانستی تيشكی ڕۆنتگەن، لە زانستی تيشك باسی بەكارهێنانی تيشكی ئێكس دەكات لە ناسينەوە و چارەكردنی نەخۆشيدا . |
| علم الأشجار | Dendrology | زانستی درەخت، درەختناسی. |

| | | |
|---|---|---|
| علمي الاقتصاد الزراعي | Agronomy | زانستی ئابووریی کشتوکاڵی. |
| علم النفس | Psychology | سایکۆلۆجی، زانستی دەروون، دەروونناسی. |
| علم النفس المقارن | Comparative psychology | زانستی دەروونی بەراورد، لقێکە لە زانستی دەروون بەراوردی بارەکانی دەروون لە نێوان مرۆڤی ئاسایی و نەخۆشی گەورە و بچووك دەکات . |
| علم النفس المرضي، علم الأمراض النفسية | Pathological-Psychology-Psychopathology | دەروونناسی نەخۆشی، خوێندنی فەرمانە دەروونییەکان بە ڕێگەی سەرنجدان لە ڕەوشتە نائاساییەکانی ئەو کەسانەی کە شێتن یان تووشی نەخۆشی دەماری بوون. |
| علم النفس البدني | Psychophysicss | زانستی دەروونی لەش، (سایکۆفیزیکس)، لقێکە لە زانستی دەروون باسی پێوەندی نێوان کردارەکانی لەش و دەروون دەکات. |
| علم النفس الفيسولوجي | Physiological-Psychology | زانستی دەروونە فەرمانییەکان، زانستی فەرمانە دەروونییەکان، خوێندنی دیاردە دەروونییەکان لە بارەی پێوەندیان بە فەرمانەکانی ئەندامەکانی لەشەوە. |
| علم النفس الاجتماعي | Social psychology | دەروونناسی کۆمەڵایەتی. |
| علم النفس التجريبي | Experimental-Psychology | دەروونناسی ئەزموونەکی، خوێندنی ئەو دیاردە دەروونییانەی کە پێوەندیان بە ئەزموونەوە هەیە. |
| علم النفس التحليلي | Analytical-Psychology | دەروونناسی شیکاری. |
| علم النفس التربوي | Educational-Psychology | دەروونناسی پەروەردەکاری. |
| علم النفس الشكلي | Gestalt psychology | دەروونناسی شێوەبەندی. |
| علم النفس الصناعي | Industrial-Psychology | دەروونناسی پیشەسازییانە. |
| علم النفس الطبي | Medical psychology | دەروونناسی پزیشکی. |
| علم النفس الطفل | Child psychology | دەروونناسی منداڵ. |
| علم النفس العام | General psychology | دەروونناسی گشتی. |
| علم النفس الوظيفي | Functional psychology | دەروونناسی فەرمانی. |
| علم النفس البيولوجي | Biopsychology | دەروونناسی زیندەگی (بایۆلۆجی). |
| علم الهندسة | Geometry | ئەندازەزانی، زانستی ئەندازە. |
| علم الهندسة الزراعية، علم الزراعة | Agricultural engineering | زانستی ئەندازیاریی کشتوکاڵی، کشتوکاڵناسی. |
| علم الآلات، ميكانيكا، علم الحيل، علم الميكانيك | Mechanics | میکانیك، ئامراز ناسی، مەکینەناسی، هێزە جووڵێنەرەکان و هێزە هاوسەنگەکان، زانستی ئامرازەکان، لقێکە لە زانستی فیزیا باسی هێز و وزە و کاریان بەسەر تەنەکاندا دەکات، هەروەها باسی کارپێکردنی ئەم زانستییە دەکات لە مەیانی دروستکردن و کارپێکردنی مەکینەدا. |
| علم الحركة، كينتيكا | Kinetics | زانستی جووڵە، جووڵەناسی، زانستێکە باسی کاری هێزەکان دەکات بەسەر جووڵەی تەنەکاندا. |
| علم المقذوفات، علم القذائف | Projectiles, Ballistics | زانستی تەنە هاوێژراوەکان، وەکو گولله. |
| علم الديناميكا الهوائية | Aerodynamics | زانستی دینامیکی هەوایی، لقێکە لە زانستی داینەمیك، باسی جووڵەی هەواو گازەکانی تر دەکات، هەروەها باسی ئەو هێزانە دەکات کە کار دەکەنە سەر تەنە جووڵاوەکانی ناو هەوا. |

| | | |
|---|---|---|
| علم وصف الشعوب | Ethnography | زانستی میللەتان، ئەو زانستییەی کە چۆنێتی دابەشبوونی ڕەچەڵەکی مرۆڤ لەسەر زەوی دەخوێنێت، میللەتناسی، نەتەوەناسی. |
| علم الحيوان الإحاثي، علم الحيوانات الحفرية، علم الركاز الحفرية | Paleozoology | زانستی گیانداره بووبەبەردەکان، (پالیۆزوولۆجی)، زانستی پاشماوەی گیانداره دێرینەکان کە بوون بە بەرد. |
| علم الخلية | Cytology | زانستی خانە، خانە ناسی، باسی پێکهاتن و فەرمانەکان و دەردەکانی خانە دەکات. |
| علم الديدان | Helminthology | زانستی کرم، زانستی کرمە مشەخۆرەکان، کرمناسی. |
| علم الديدان الخيطية | Nematology | زانستی کرمە دەزوولەییەکان. |
| علم الرخويات، علم النواعم | Malacology, Chonchology | زانستی گیاندارە نەرمەکان وەکو گیانداری هێلکە شەیتانۆکە و گوێچکەماسی، چونکە (مالاکوس) لە یۆنانیدا نەرم دەگرێتەوە، زانستی نەرمۆڵەکان، نەرمۆڵەناسی. |
| علم الرياح | Anemology | ئەنیمولۆجیا، زانستی دەربارەی ئەو ڕووداوانەی کە بەسەر (با) دا دێت، زانستی با، باناسی. |
| علم الوراثة الخلوي | Cytogenetics | زانستی زکماکی خانەیی، باسی دەوری خانە دەکات لە پەیداکردنی دیاردەکانی زکماکی و گۆڕیندا. |
| علم الرياضات | Mathematics | بیرکاری، زانستی دۆزینەوەی هەندێ بڕی نادیار (نەزانراو) وەکو ژمێرە و جەبر و زەوی پێوان. |
| علم السكون، ستاتيك | Statics | زانستی وەستان، لقێکە لە زانستی میکانیك، باسی تەنە وەستاوەکان یان هێزە هاوسەنگەکان دەکات، وەستانناسی، (ستاتیك). |
| علم الصحة | Hygiene, Hygieology, Hygiology, Hygienics | زانستی تەندروستی، باسی چۆنێتی پاراستنی تەندروستی مرۆڤ دەکات، تەندروستناسی. |
| علم الصوت، صوتيات | Acoustics, Phonics, Phonetics | زانستی دەنگ، دەنگناسی. |
| علم الصواريخ | Rocketry | زانستی ڕۆکێت، باسی چۆنێتی دروستکردن و خستنەکاری ڕۆکێت (ساروخ) دەکات، ڕۆکێتناسی، موشەکناسی. |
| علم السلوك | Paxiology, Bevavioural-science | زانستی ڕەفتار، خوێندنی ڕەفتاری مرۆڤ یان گیاندار بە ڕێگەی تێبینین و تاقیکردنەوە، ڕەفتارناسی. |
| علم الطفيليات | Parasitology | پاراسیتۆلۆجی، زانستی گیاندارە مشەخۆرەکان (ئەو گیاندار و ڕووەکانەی کە لەسەر گیاندار و ڕووەکی تر دەژین، زانستی مشەخۆرەکان، مشەخۆرناسی. |
| علم الطوبوغرافيا | Topography | تۆپۆگرافی، باسکردنی یان وێنەگرتنی هەرێم و ناوچەکانی زەوی وەکو تەپۆڵکە و گرد و شیو و گۆم و ڕووبار و ڕێگاوبان و پرد، (تاپۆگرافی)، شوێنناسی، زانستی شوێن. |
| علم طبقات الأرض | Stratigraphy | زانستی چینەکانی زەوی. |
| علم الأحياء الإشعاعي | Radiobiology | زانستی زیندەکی تیشکییانە، لقێکە لە زانستی زیندەوەر، باسی کارلێکی دەزگا زیندەوەرییەکان و وزەی تیشکی و مادە تیشکدەرە چالاکەکان دەکات. |
| علم تشكل الصخور | Tectonics | زانستی پەیدابوونی کەڤرەکان، نانستییەکە باسی ئەو گۆڕانانە دەکات کە بەسەر کەڤرەکاندا دێن وەکو چرچ و شکان و پەیدابوونی چیاکان. |

| | | |
|---|---|---|
| علم البرمائيات | Amphibiology | زانستی گیانداره تەڕ و وشكیيەكان (وشكاوىيەكان) وەكو بۆق، وشاكاوەكيناسی، زانستی وشكاوەكیيەكان. |
| علم البالثنولوجيا | Paleethnology | پالیثنۆلۆجی، لقێكە لە زانستی ڕەگ و ڕەچەڵەكانی مرۆڤ، باسی مرۆڤی پێش مێژوو دەكات. |
| علم الأخلاق | Ethics | زانستی خووڕەووشت. |
| علم البحيرات | Limnology | زانستی گۆمەكان (دەریاچەكان)، دەریاچەناسی، گۆمناسی. |
| علم الأمراض | Pathology | زانستی نەخۆشیيەكان، وشەی (پاتۆس) لە یۆنانیدا بە مانای نەخۆشی دێت، نەخۆشیناسی. |
| علم اللهجات | Dialectology | زانستی شێوەكانی زمان. |
| علم التقويم الجيولوجي | Geochronology | زانستی كاتنامەی جیۆلۆجی، زانستی ساڵنامەی جیۆلۆجی، زانستی قەبلاندنی تەمەنی كەڤر و چینەكانی زەوی. |
| علم الأحياء الدقيقة، علم الجراثيم، علم الميكروبات | Microbiology | زانستی زیندەوەرە وردەكان، میكرۆبناسی، زانستی میكرۆبەكان، (مایكرۆبایۆلۆجی). |
| علم وصف الجو | Aerography | زانستی كەش، باسی ڕەوشتی بەرگی كەشی دەوروپشتی زەوی دەكات، كەشناسی. |
| علم الفيزيوغرافيا، علم الجغرافية الطبيعية | Physiography | فیزیۆگرافی، زانستی سروشت یان دیاردە سروشتیيەكان، سروشتناسی. |
| علم الهواء، علم طبقات الهواء | Aerology | زانستی كەش، ناسیاریی هەوا، هەواناسی. |
| علم الأجناس، علم الشعوب، علم الأعراق البشرية | Ethnology | ئەثنۆلۆجی، ١. زانستی میللەتان، ئەو زانستیيەی كە دابەشبوونی میللەتان لەسەر زەوی دەخوێنێت. ٢. زانستی ڕەگەزەكانی ئادەمیزاد. |
| علم الكلمات، علم المفردات | Lexicology | لیكسیۆلۆجی، زانستی ووشە. |
| علم الطبّ | Medicine, Iatrology | زانستی پزیشكی. |
| علم الطحالب | Phycology, Algology | فایكۆلۆجی، زانستی قەوزەكان، قەوزە ناسی. |
| علم العلاجات | Imatology | زانستی چارەكردن، چارەناسی. |
| علم الطيور | Ornithology | زانستی باڵندەكان، چونكە لە یۆنانیدا (ئۆرینت) بە مانای باڵندە دێت، باڵندە ناسی. |
| علم نشوء النوع | Phylogeny | زانستی پەیدابوونی جۆر، زانستی پەیدابوون یان گەشەكردنی جۆرێك لە گیاندار یان ڕووەك. |
| علم الغدد | Adenology | زانستی لووەكان، زانستی گلاندەكان، لووناسی. |
| علم الفلك | Astronomy | زانستی ئەستێرە، وەكو ئەستێرەكان و تەنە ئاسمانیيەكان، ئەستێرەناسی. |
| علم الطبيعة الفلكية، علم الفيزياء الفلكية | Astrophysics | ئەسترۆفیزیك، زانستی فیزیایی ئەستێرەكان، لقێكە لە زانستی ئەستێرەكان، باسی ڕەووشت و دیاردە فیزیایيەكانی تەنە ئاسمانیيەكان دەكات. |
| علم وصف النبات | phytography | زانستی ڕووەك، ڕووەكناسی. |
| علم الطيران الشراعي | Aerodonetics | زانستی فڕینی چارۆكەداری. |
| علم التربية، علم اصول التدريس | Pedagogy | زانستی پەروەردە. |

| | | |
|---|---|---|
| علم الطيران، فَن الطيران، الطيرانيات | Aeronautics | ئيرۆناوتيكس، زانستى فرۆكەوانى، هونەرى فرۆكەوانى. |
| علم التوافقيات، علم الأنغام، علم الأصوات الموسيقية | Harmonics | زانستى ئاوازەكان، زانستى دەنگە مۆسيقىيەكان (هارمۆنيك). |
| علم الطيف، علم تحليل الطيف | Spectrology | زانستى شەبەنگ، شەبەنگناسى. |
| علم العظام | Osteology | زانستى ئێسك، ئێسكناسى. |
| علم العضلات | Myology | زانستى ماسولكە، ماسولكەناسى. |
| علم الأغذية | Bromatology | زانستى خۆراك، خۆراكناسى. |
| علم السكان | Demography | زانستى دانيشتووانى ولات، دانيشتووانناسى. |
| علم الأعضاء | Organology | زانستى ئەندامەكان، خوێندنى پێكهاتن و فەرمانەكانى ئەندامەكانى لەش وەكو خوێندنى ئەندامەكانى لەشى گيانەوەر و ڕووەك، ئەندامناسى. |
| علم الهندسة المدنية | Civil-engineering | زانستى ئەندازەى شارستانێتى. |
| علم حسابات التفاضل | Differential-calculus | زانستى ژمێرەى جياكارى. |
| علم الهندسة- الكهربائية | Electric-engineering | زانستى ئەندازەى كارەبايى. |
| علم الكهربائية، الكهربائية | Electricity | زانستى كارەبا، كارەباناسى . |
| علم حساب التكامل | Integral-calculus | زانستى ژمێرەى تەواوكارى . |
| علم رسم الخرائط | Chartograph | نەخشەناسى، زانستى نەخشەكێشان، وێنەكردنى نەخشە، نەخشەناسى، هونەرى نەخشە دروستكردن. |
| علم الستاتيكا الهوائية، علم توازن الهواء | Aerostatics | ئيرۆستاتيكس، زانستى هاوسەنگى هەوا، زانستى هەواو گازەكانىتر و هاوسەنگى ئەو تەنانەى كەوان تيايدا . |
| علم الكواكب | Planetplogy | زانستى ئەستێرە گەڕۆكەكان، هەسارەناسى. |
| علم التميع و الأنسياب | Rheology | زانستى لێشاو، زانستى خوێندنى ناڕێك بوونى شێوەى مادە و چۆنيەتى شل بوونەوەى وەكو لە كەرە و پەنيردا . |
| علم الأمراض الشعاعية، علم الباثولوجيا الأشعاعية | Radiopathology | زانستى نەخۆشىيەكان بە ڕێگەى تيشك، زانستى نەخۆشىيە تيشكىيەكان . |
| علم الغابات | Forestry | زانستى دارستان، دارستاناسى. |
| علم السلالات البشرية، علم الأنسان، علم وصف الأنسان | Anthropology | زانستى مرۆڤ ، مرۆڤناسى، باسى بنەڕەتى ڕەگەز و ڕەچەڵەكەكان و گەشەكردن و خووڕەوشت و كەلەپوور و بارى ژيان و ئايينەكانى مرۆڤ دەكات. |
| علم الفلسفة ( الفالسفة) | Philosophy | فەلسەفە، خۆويستى عەقڵ و حيكمەت و گەڕان بە شوێن ڕاستيدا لە ڕێگەى بيركردنەوەوە نەوەك لە ڕێگەى تاقيكردنەوە . |
| علم تحسين النسل | Eugenics | زانستى چاكردنى وەچە، چاكردنى وەچەى گياندار و ڕووەك بۆ مەبەستى بەرژەوەندى مرۆڤ. |
| علم الفسلجة، علم الوظائف | Physiology | زانستى فەرمان، فەرمانى ئەندامەكانى لەشى زيندەوەر، فيزيۆلۆجى، فەرماننناسى. |
| علم الفيزياء، علم الطبيعة | Physics, Natural science, Physical science | زانستى فيزيا ( فيزيك)، زانستى سروشت. |

| | | |
|---|---|---|
| علم الهياكل | Skeletology | زانستی پەیکەری لەش، پەیکەرناسی، زانستی پەیکەر . |
| علم الالكتروستات، علم الأستاتيكا الكهربائية | Electrostatics | ئەلیکترۆستاتیکس، زانستی ستاتیکسی کارەبایی. |
| علم الهندسة الهيدروليكية، هندسة السوائل المتحركة | Hydraulic-engineering | زانستی ئەندازیاری هایدرۆلیك، ئەندازیاری شلە جووڵاوەکان . |
| علم الفلك الأشعاعي | Radio-astronomy | زانستی ئەستێرە بە هۆی ڕادیۆوە، ئەستێرەناسی تیشکی. |
| علم الأمراض العقلية-العاطفية | Pathematology | زانستی نەخۆشییە ژیری و سۆزییەکان . |
| علم القلب | Cardiology | زانستی دڵ، دڵناسی. |
| علم القمر | Selenology | زانستی مانگ، مانگناسی. |
| علم الكيمياء | Chemistry | زانستی کیمیا، کیمیاناسی. |
| علم الكون | Cosmology | زانستی گەردوون، زانستی چەرخ و جوگرافی و جیۆلۆجی دەگرێتەوە، باسی بنەڕەت و پێکهاتن و یاساکانی گەردوون دەکات، گەردووناسی. |
| علم عسكري، (علوم عسكرية) | Military-science | زانستیسەربازی، سەربازناسی. |
| علم الغدد الصم | Endocrinology | زانستی لووە کوێرەکان ( لووکەرەکان). |
| علم الأنهار | Potamology | زانستی ڕووبارەکان، ڕووبارناسی. |
| علم الأطعمة | Food science | زانستی خۆراك، خۆراکناسی. |
| علم الأوبئة الحيوانية | Epizootiology | زانستی دەرەکانی گیاندار. |
| علم الثمر، علم الأثمار | Carpology | زانستی ڕووەکەکان . |
| علم الجراد | Acridology | زانستی کوللە، کوللەناسی. |
| علم الصناعة ، تكنولوجيا | Technology | تەکنۆلۆجی، زانستی پیشەسازی . |
| علم الفيروسات | Virology | زانستی ڤیرۆسەکان، ڤیرۆسناسی، زانستی ئەو زیندەوەرە وردانەی کە بە میکرۆسکۆپی ئاسایی نابینرێن . |
| علم الفاكهة | Pomology | زانستی میوە، میوەناسی. |
| علم النار، يحل بالحرارة العالية | Pyrology, pyrolyze | زانستی ئاگربەربوونەوە، چۆنیەتی پاراستنی ، زانستی دارستان لە ئاگربەربوونەوە ، ئاگرناسی. |
| علم الفطريات | Mycology, Mycetology | زانستی کەڕووەکان ، کەڕووناسی، ئەو زانستەیە کە باسی کەڕووەکان دەکات لە ڕووی پێکهاتن و جۆر و سوود و زیانیانەوە وەکو کەڕوو و قارچك و دومەڵان. |
| علم النبات الطبي | Medical-botany | زانستی ڕووەکی پزیشکی. |
| علم الشيخوخة | Gerontology | زانستی پیری، زانستی تەمەنی پیری، پیرناسی. |
| علم الدم | Hematology | زانستی خوێن، خوێنناسی. |
| علم الكيمياء الضوئية | Photo chemistry | زانستی کیمیایی ڕووناکییانە. |
| علم الأحياء النفسي | Psychobiology | زانستی زیندەگ دەروونی. |
| علم الأنف | Nasology | زانستی لووت، لووتناسی. |
| علم الطب الأشعاعي | Radiology | ڕادیۆلۆجی، زانستی پزیشکی تیشکی، زانستی بەکارهێنانی وزەی تیشکی لە مەیانی پزیشکیدا . |

| | | |
|---|---|---|
| علم البيئة | Ecology | زانستی ژینگە، لقێکە لە زانستی زیندەوەر، باسی پەیوەندییەکانی نێوان زیندەوەرەکان و شوێنەوارەکەیان دەکات ، ژینگەناسی. |
| علم المناخ | Climatology | زانستی ئاووهەوا. |
| علم المیاه، مائیات | Hydrology | زانستی ئاوەکان، باسی سیفەتی ئاو و دابەشبوونی لە سەر و لەناو زەوی و هەوادا دەکات ، ئاوناسی. |
| علم الإقتصاد | Economics | زانستی ئابووری ، ئابووریناسی. |
| علم الإحصاء | Statistics | زانستی ئامار، ئامارناسی. |
| علم الزراعة | Agriculture | زانستی کشتوکاڵ. |
| علم أعضاء التناسل | Edeology | زانستی ئەندامەکانی زاوزێ. |
| علم المدفعية، علم إستعمال المدافع | Gunnery, Artillery | زانستی تۆپچێتی، زانستی بەکارهێنانی تۆپ، تۆپناسی. |
| علم الفم | Oralogy | زانستی دەم، دەمناسی. |
| علم التعاجيب، علم غرائب الخلقة، علم المسوخ و التشويهات | Teratology | زانستی عاجباتییەکان، زانستی هۆی نارێکی لە لەشی گیاندار و ڕووەك ، زانستی زیندەوەرە نائاسایی یان سەیر یان نارێکەکان ، وەکو ئەو منداڵانەی کە شێوەیەکی نارێکیان هەیە . |
| علمالأمراض الجلدية | Dermatology | زانستینەخۆشییەکانی پێست. |
| علم المعادن، علم العدانة | Mineralogy | زانستی کەرەسەخاوەکان، زانستی کەرەسەخاوەکانی کانزاکان. |
| علم وصف الفلزات، المعدغرافيا | Metallography | کانزاناسی، باسی کانزا ڕەقەکان و دارشتەکان بە تایبەتی لە ڕێگەی میکرۆسکۆپەوە لە ڕووی پێکهاتنەوە و پەیوەندی ئەو پێکهاتنە بە ڕەوشت و پیشەسازییەوە. |
| علم الفلزات، علم التعدين، علم إستخراج المعادن | Metallurgy | کانزاناسی، باسی چۆنیەتی پوختەکردنی کانزاکان ( میتاڵەکان) دەکات لە کەرەسە خاوەکانیان هەروەها پاڵاوتن و پێکهاتن و ڕەوشتیان. |
| علم الجغرافية الطبيعية | Physical geography, Physiography | زانستی جوگرافیای سروشت، کانزاناسی باسی سروشت و دیاردە سروشتییەکان . |
| علمالديناميكا الكهربائية | Electrodynamics | ئەلیکترۆداینەمیکس، زانستی دینامیکی کارەبایی. |
| علم البصريات الألكترونية | Electron-optics | زانستی بینایی ئەلیکترۆنی ، زانستی بینایی کارەبایی . |
| علم الكيمياء الفيزيائية | Physical chemistry | زانستی کیمیای فیزیایی، لقێکە لە زانستی کیمیا، باسی پەیوەندی نێوان کیمیا و فیزیا دەکات . |
| علم الفراسة، علم القيافة | Physiognomy, Prosposis | زانستی سەروسیما، خوێندنی ڕوخسار و سەروسیمای مرۆڤ بە بۆنەی ئەوەی کە بەڵگەیەکن بۆ ڕەفتار و ڕەوشت |
| علم الجغرافية النباتية | Phytogeography | زانستی جوگرافیای ڕووەك، خوێندنی چۆنیەتی بڵاوبونەوەی ڕووەك لەسەر ڕووی زەوی . |
| علمالديناميكا الهوائية | Aerodynamics | زانستی دینامیکی هەوا، لقێکە لە زانستی دینامێك، باسی جووڵانەوەی هەوا و ئەو تەنانەی کە لە هەوادا دەجووڵێنەوە دەکات. |
| علم الكيمياء الصناعية | Industrial-chemistry | زانستی کیمیایی پیشەسازییانە . |
| علم التكنولوجيا الحيوية | Biotechnology | زانستی تەکنۆلۆجی زیندەوەریی، لقێکە لە زانستی تەکنۆلۆجی ، باسی چۆنیەتی کارپێکردنی یاسا و دیاردە زیندەگی و ئەندازەییەکان دەکات بەسەر ئەو گیروگرفتانەدا کە پەیوەندیان بە مرۆڤ و مەکینە و ئامرازەوە هەیە. |
| علم تكوين الخلايا | Cytogentics | زانستی پێکهاتنی خانە. |

| | | |
|---|---|---|
| علم التنويم، علم الأستهواء | Neurohypnology, Neurypnology | زانستی خەواندن. |
| علم الحرارة | Thermology | زانستی گەرمی، گەرمیناسی. |
| علم الذكور | Andrology | زانستی نێرەکان، زانستی گیاندارە نێرەکان. |
| علم السموم الأحيائية | Biotoxicosis | زانستی ژەهرە زیندەگییەکان . |
| علم الثرميونيات، علم الظواهر الثرميونية، علم الشوارد الحرورية | Thermionics | زانستی تێرمیۆن، زانستی ئەو تەنۆکانەی کە بە کارەبا بارگەکراوانە لە لایەن مادە گرگرتووەکانەوە دەردەپەڕن، ( تێرمیۆنگ). |
| علم الموسيقى | Musicology | زانستی مۆسیقا ، خوێندنی مۆسیقا بەوەی کە یەکێکە لە مەیانەکانی لێکۆڵینەوە، (مۆسیقاناسی). |
| علم صحة الأطفال | Padology, Pedology | زانستی تەندروستی منداڵان. |
| علم القبالة ، فَن القبالة | Obstetrics | زانستی دایەنگەریی، زانستی ( هونەری) منداڵ لە دایکهێنان. |
| علم الأساطير | Mythology | زانستی داستانەکان، زانستی خوێندن و لێکدانەوەی ئەفسانە و حەقایەت، (داستانناسی). |
| علم المتاحف | Museology | زانستی مۆزەخانە، مۆزەخانەناسی. |
| علم المسكوكات، علم النميات | Numismatics | زانستی دراوەکان، خوێندن یان کۆکردنەوەی پارە و مەدالیا و کاغەزی دارایی هتد، دراوناسی. |
| علم الزمهرير، علم القريات ، علم الصقيع | Cryogenics | زانستی وەیشومە، ئەو زانستەیە کە باسی پەیداکردنی پلەیەکی گەرمی نزمتر لە پلەی کولانی ئۆکسجینی شل (-١٨٣) و زانستی رەوشتی مادە جیاوازەکان لەم پلەیەدا دەکات، زانستی زوقم، زوقمناسی، وەیشومەناسی. |
| علم النواميس الطبيعية | Physionomy | زانستی یاساکانی سروشت . |
| علم النور | Photology | زانستی رووناکی ، رووناکیناسی. |
| علم التوليد | Tocology | زانستی منالْ لە دایکهێنان. |
| علم التسمية | Onomatology | زانستی ناولێنان. |
| علم الأورام | Oncology | زانستی دومەلْ، دومەڵناسی. |
| علم الأذن | Otology | زانستی گوێچکە، گوێچکەناسی. |
| علم أمراض الخلية | Cellular pathology | زانستی نەخۆشییەکانی خانە. |
| علم الجرعات | Posology | زانستی ژەمی دەرمان. |
| علم خواص الغازات | Pneumatics | زانستی رەوشتی گازەکان . |
| علم الأحياء الفضائي | Space biology | زانستی زیندەگی ئاسمانی (بۆشایی) |
| علم السموم | Toxicology | زانستی ژەهرەکان، ژەهرناسی. |
| علم الطيف | Spectrology | زانستی شەبەنگ، شەبەنگناسی. |
| علم الطاقة | Energetics | زانستی وزە، وزەناسی. |
| علم المفاصل | Arthrology | زانستی جومگە، جوگەناسی. |
| علم الأكترونيات | Electronics | ئەلەکترۆنیك ، زانستی ئەلەکترۆنەکان، زانستی دەرپەڕین و رەفتار و کاری ئەلەکترۆن لە بۆشای و گازەکاندا هەروەها چۆنیەتی بەکارهێنانی ئامرازە ئەلەکترۆنیەکان ، ئەلەکترۆنناسی. |
| علم الكيمياء الأرضية، جيوكيمياء | Geochemistry | زانستی کیمیای زەوی، زانستێکە دەربارەی پێکهاتنی تونکلی زەوی دەدوێ لە رووی کیمیاگەرییەوە، هەروەها باسی ئەو گۆڕینانە دەکات کە بەسەریدا دێت . |

| | | |
|---|---|---|
| علم الاعلام | Onomastics | زانستی ڕاگەیاندن |
| علم الدواجن، دجانة | Domestication-science, Poultry science | زانستی ماڵیکردن، ئەو زانستەیە کە باسی وەچە و ڕەچەڵەك و ڕێگەی پەروەردەکردنی پەلەوەر دەکات . |
| علم الكيمياء النباتية | Phytochemistry | زانستی کیمیای ڕووەك . |
| علم الأحراج | Silviculture | زانستی دارودەوەن. |
| علم التأريخ الطبيعي | Natural-history | زانستی مێژووی سروشت، زانستی مێژووی گیاندار و ڕوەك. |
| علم التدبير المنزلي | Domestic science | زانستی ماڵداری. |
| علم الكيمياء الأشعاعية | Radio-chemistry | زانستی کیمیای تیشکی. |
| علم المثلثات | Trigonometry | زانستی سێگۆشەکان . |
| علم فراسة الدماغ | Phrenology | زانستی خوێندنی کەللەی سەر بەو پێیەی کە شێوەی کەللەی سەر بەڵگەیەکە بۆ کەسێتی و بەهرەی ژیری . |
| علم المساحة، جيوديسيا | Geodesy, Surveying | ( جیۆدیسیا) ، زانستی ڕووبەر پێوان، زانستی پێوانی ڕووبەری زەوی و گواستنەوەی بۆ سەر نەخشە. |
| علم الأعصاب | Neutology | زانستی دەمار، دەمارناسی. |
| علم الجغنوسيا | Geognosy | جیۆگنوسی، لقێکە لە زانستی جیولۆجی، باسی پێکهاتنی گشتی زەوی دەکات لە ناوەوە و دەرەوە . |
| علم الموائع المتحركة | Hydrokinetics | هایدرۆکاینتیکس، زانستی شلەجوولاوەکان. |
| علم المعاجم ، تاليف المعاجم | Lexicography | لێکسیکۆگرافی، دانانی فەرهەنگ، زانستی فەرهەنگ، فەرهەنگناسی. |
| علم الإيقونات، علم الصور المقدسة | Iconology | زانستی وێنە و پەیکەرە پیرۆزەکان . |
| علم النبات | Botany, Phytology | زانستی ڕووەك، ڕووەکناسی. |
| علم وصف النبات | Phytography | زانستی باسی ڕووەك. |
| علم الإسنان | Odontology | زانستی ددانەکان. |
| علم نظري | Theoretical-science | زانستی بیردۆزەیی، زانستی تیۆرییانە. |
| علم النبات الأحاثي، علم النباتات الحفرية، علم الركاز النباتية | Paleobotany, Paleophytology | پاڵیۆبۆتانی، زانستی خوێندنی پاشماوەی ڕووەکە دێرینەکان کە بوون بە بەرد، زانستی ڕووەکە بووبەبەردەکان. |
| علم العلاج، علم المعالجة ، علم المداواة | Therapeutics | زانستی چارەکردنی نەخۆشی بە دەرمان و خواردەمەنی و وەرزش و تیشك و کارەبا و گەرمی . |
| علم الوراثة، علم النسل | Genetics | زانستی زکماکی. زانستی کنێتی. |
| علم الأصداف، علم المحارير | Conchology | زانستی لەپکەو گوبچکەماسی. |
| علم الفيزياء النووية | Nucleonics, Nuclear-physics | زانستی فیزیای ناوکی ئەتۆم (گەردیلە) |
| علم الحيوانات الزراعية | Agricultural-zoology | زانستی گیانداردکانی کێلگە . |
| علم الصناعات الزراعية | Agricultural-technology | زانستی پیشەسازییە کشتوکاڵییەکان |
| علم بيض الطيور | Oology | ئوولۆجی، زانستی جوری هێلکەی باڵندە، هێلکەناسی |
| علم التجبير | Orthopedics | زانستی ئێسککگرتنەوە ، زانستی ڕاستکردنەوەی ئەندامە خوارەکان، زانستی ئێسککگرتنەوە |

| | | |
|---|---|---|
| علم قوة السوائل | Hydrodynamics | هايدرۆداينەميكس، زانستی هێزی شلەكان . |
| علم شكل الارض، جيومورفولوجيا | Geomorphology | جيۆمۆرفۆلۆجی، زانستی شێوەی زەوی، خوێندنی شێوەی زەوی ( بەرزی و نزمی) و دابەشبوونی ئاو و وشكانی لەسەر ڕووی زەوی . |
| علم السرخسيات | Pteridology | زانستی ڕووەكە سەرخەسی‌یەكان ( وەكو قەیتەران). |
| علم توازن السوائل، علم الموائع السكونية | Hydrostatics | ( هايدرۆستاتيك)، زانستی هاوسەنگبوون و پەستانی شلەكان ، زانستی هاوسەنگی شلەكان . |
| علم التصوير السينمائي، فن التصوير السينمائي | Cinematography | زانستی وێنەگرتنی فیلمی سینەمایی. |
| علم المحيطات، علم البحار | Oceanography | زانستی دەرياكان، زانستی زەرياكان ، زەرياناسی. |
| علم دراسة الأحجار ، علم الصخور | Petrology, Lithology | خوێندنی بەردەكان لە ڕووی بنچینە و مێژوو پێكهاتن و پۆل كردنيانەوە، كەڤرناسی، بەردناسی. |
| علم الهندسة الكيمياوية | Chemical-engineering | زانستی ئەندازەی كیمیایی. |
| علم وصف الأحجار ، علم وصف الصخور | Petrography | بەردناسی، زانستێكە باسی كەڤرەكان و پۆلكردنيان دەكات. كەڤرناسی |
| علم المياه العذبة | Limnology | زانستی ئاوە شیرینەكان. |
| علم جيولوجيا الأرض، جيولوجيا | Geology | جيۆلۆجی، زەویناسی، زانستی زەوی. |
| علم السوائل المتحركة، هيدروليات | Hydraulics | هايدرۆليكس، زانستی شلەجوولاوەكان . |
| علم الوقت، علم الزمن | Chronology | زانستی دابەشكردنی كات، ( كرۆنۆلۆجی)، دابەشكردنی كات بەسەر چەند ماوەیەكدا و دەستنیشانكردنی مێژووی ڕووداوە گرنگەكان و ڕێكخستنیان بە پێی كات، كاتناسی. |
| علم الطبّ البيطري | Veternary-medicine | زانستی بەیتاڵی، زانستی ناسینەوە و چارەكردنی نەخۆشی‌یەكانی گیاندار. |
| علم عملي، علم تطبيقي، علم التقنية، تكنولوجيا | Technology | تەكنۆلۆجی، زانستی چۆنیەتی بەكارهێنانی شێوازی هونەر و زانستی لە مەیانی ئیشوكار و پیشەسازیدا. |
| علم السياسة الطبيعية | Geopolitics | زانستی ڕامیاری سروشتی، كاری جوگرافیا و ئابووری ئادەمیزاد ( چۆری دانیشتوان و دابەشبوونیان) بەسەر ڕامیاری دەوڵەتدا ، جیۆپۆلیتیك. |
| علم الفيزياء الفلكية | Astrophysics | زانستی فیزیای ئەستێرەیی، لقێكە لە زانستی ئەستێرەوانی ، باسی ڕەوشت و دیاردە فیزیاییەكانی تەنە ئاسمانی‌یەكان دەكات . |
| علم فسلجة النبات | Phytophysiology | فسیۆلۆجی ڕووەك، زانستی فەرمانەكانی ئەندامەكانی ڕووەك . |
| علم وظائف الأعصاب | Neurophysiology | زانستی فەرمانەكانی دەمار. |
| علم قياس الوقت | Horology | هۆرۆلۆجی، زانستی ژماردنی كات، هونەری دروستكردنی كاتژمێر ( سەعات). |
| علم الزراعة ، فن الزراعة، الهندسة الزراعية | Geoponics, Agronomy | زانستی كشتوكاڵ، هونەری كشتوكاڵ. |
| علم النوويات، علم الفيزياء النووية | Nucleaonics, Nuclear-physics | نیوكلیۆنیكس، زانستی گەردیلە، زانستی دیاردەكانی ناوكی گەردیلەی مادە، زانستی فیزیای ناوكی گەردیلە یان ئەتۆم. |
| علم النواة الخلية | Karyology | زانستی ناوكی خانەی زیندەوەر. |

| | | |
|---|---|---|
| علم القياس | Mensuration | زانستی پێوانە، لقێکە لە زانستی بیرکاری، باسی پێوانی درێژی و ڕووبەر و قەبارە دەکات . |
| علم أبحاث الفضاء ، علم الملاحة الفلكية | Astronautics | ئەستروناوتیکس، زانستی کەشتیەوانی ئەستێرەوانی ، زانستی باسی ئاسمان ، خوێندنی هاتووچۆکردن و کەشتییەوانی لە بۆشایی نێوان ئەستێرەکاندا ، ئەمەش دروستکردنی کەشتی ئاسمانی و مانگی دەستکرد و چۆنیەتی پاراستنی ژیانی زیندەوەر لە ئاسماندا دەگرێتەوە. |
| علم وصف المياه | Hydrography | هایرۆگرافی، زانستی باسی ئاو لە گۆم و ڕووبار و دەریا و زەریاکاندا ، ئاوناسی. |
| علم الهندسة النووية | Nuclear-engineering | زانستی ئەندازەی ناوکی. |
| علم السلالات البشرية القديمة | Paleethnology | زانستی ڕەگ و ڕەچەڵەکی مرۆڤی بەر لە مێژوو. |
| علم المحاصيل الحقلية | Horticulture | زانستی بەروبوومی کێڵگەیی. |
| علم الأمراض النباتية | Plant pathology | زانستی نەخۆشییەکانی ڕووەك. |
| علم الحشرات – الاقتصادية | Economic-etnomology | زانستی مێرووە ئابوورییەکان. |
| علم الألبان | Dairy science | زانستی شیرەمەنی. |
| علم الموازين | Criteriology | زانستی تەرازووەکان . |
| علم الجيوجنوسي | Geognosy | جیۆگنۆسی، لقێکە لە جیۆلۆجی، باسی ئەو شتانە دەکات کە خڕۆکی زەوی لێ پێکهاتووە . |
| علم الأنواء الجوية | Meterology | کەشناسی، زانستی دیاردەکانی کەش، وەکو با و باران . |
| علم الطبقات الإحيائي | Biosratigraphy | خوێندنی چینەکانی زەوی، لە بارەی بوونی تان و پۆی ئەو بووبەبەردانە کە تیایدا هەن. |
| علم الطبقات | Strafigraphy | خوێندنی چینە جیۆلۆجیەکان ، لقێکە لە جیولۆجی لە پەیدابوون و پێکهاتن و بەدواهاتن و پەیوەندی نێوان کەڤرە چینداره‌کان دەکۆڵێتەوە. |
| علم المستحاثات الدقيقة، علم الأحافير الدقيقة | Micropalentology | زانستی بووبەبەردە وردەکان . |
| علم الجيولوجيا المائية، هيدروجيولوجيا | Hydrogeology | جیۆلۆجیای ئاو، هایدرۆجیۆلۆجی. |
| علم الرواسب | Sedimentology | زانستی نیشتەنییەکان، زانستی گڵ و بەردی چینەکانی زەوی . |
| علم الجيولوجيا الأقتصادية | Economic-geology | زانستی بەکارهێنانی ئەنجامەکانی جیۆلۆجی لە مەیانی ئابووریدا ، جیۆلۆجی ئابووری. |
| علم الجيولوجيا التاريخية | Historical-geology | جیۆلۆجی مێژوویی، زانستی مێژوویی چینەکانی زەوی لە ڕێگەی کەڤر و بووبەبەردی ناو چینەکانییەوە . |
| علم الأحياء القديمة | Palaeontology, Palaeobiology | زانستی زیندەوەرە کۆنەکان . |
| علم وصف الجبال | Orography | زانستی باسی چیاکان. |
| علم الحمامات | Balenology | زانستی گەرماوەکان، زانستی بەکارهێنانی گەرماوەکان و ئاوە کانزاییەکان بۆ مەبەستی پزیشکی . |
| علم نشاة الصخور | Lithogenesis | زانستی پەیدابوونی کەڤرەکان، لقێکە لە زانستی کەڤرەکان لە بنەڕەتی کەڤرەکان دەکۆڵێتەوە بە تایبەتی کەڤرە ئاگرینەکان . |

| | | |
|---|---|---|
| علم الصخور | Petrology | زانستی کەڤرەکان . |
| علم الصناعة، علم التكنولوجيا | Technology | زانستی تەکنەلۆجی ، تەکنەلۆجی، بەکارهێنانی زانستییەکان لە مەیانی پیشەسازیدا . |
| علمي | Scietefic | زانستانە، زانستیيانە . |
| علمية، قنطروسامة | Centrosema | (سێنترۆسیما) ، گیایەکە گوڵەکەی لە پەپوولە دەچێت . |
| عُلمة، شرم، فلح الشفة، شفة جانبية، شفة ارنبية | Harelip | داقلیشانی لێو، قلیشێك لە لێوی مرۆڤدا لە لچی کەروێشك دەچێت . |
| عَلِن | Open, Puplic | ئاشکرا . |
| علني، جهري | Open, Puplic | ئاشکرایی، بەئاشکرا. |
| علند، إيلند، أروس | Oryx, Eland, Antelop | مانگاکێوی، مانگا کێویەکی ئەفریقی گەورەیە، گیاندارێکە لە کۆمەڵەی ئاسکە، لەشەکەی کەتەیە، شاخەکەی پێچاوپێچە باریك و درێژە. |
| علندة، علدي، عدام، علدي الحبال | Hill-ephedra, Woody horse-tail | ئەفیدرای شاخی، درەختی کلکەئەسپ، ڕووەکێکی تۆوداره. |
| علهب | Hippotragus-egoceros, Stag | ١. جۆرێکی گەورەیە لە مانگاکێوی، ڕەنگەکەی شین یان ڕەش یان خاکییە.<br>٢. گاکێوی. |
| علهز ۱ | Psoroptes | گەنەی گەڕیی، جۆرە گەنەیەکە لەسەر پێستی ولاخ و ئاژەڵ دەژی و دەبێتە هۆی گەڕی. |
| علو، إرتفاع | Height, Altitude, Elevation | بڵندیی، بەرزایی، بەرزی . |
| علوي | Upper, Superior | سەروو، سەرەوە. |
| علوك، سيلان، نمنومة، صمغ الذباب | Campion, Catchfly, Silene | گیایەکە لە کۆمەڵەی مێخەکە، دەشتەکی و پزیشکییە ، گوڵەکەی سوور و سپی و زەردە. |
| علوض، علوش | Jackal | چەقەڵ، تورگ. |
| علوق، نزافة | Desmodus, Vampire bat | شەمشەمەکوێرەی خوێنمژ، جۆرێکە لە شەمشەمەکوێرە خوێنی گیاندار و مرۆڤ ( لە کاتی نوستندا) دەمژێت . |
| علياء، سماء | Heavens | ئاسمان. |
| على التوازي | Inparallel | بەهاورێکی، بەتەریبی. |
| على التوالي | Inseries | یەك لە دوای یەك. |
| على العكس | Inversely | بە پێچەوانەوە. |
| علبة | Pyxidium, Capsule | قوتۆکە، جۆرێکە لە بەری ڕووەك لە قوتو دەچێت، تووەکانی تێدایە وەکو قۆزاخەی لۆکە . |
| عليق الدواب، علف | Forage, Fodder | ئالیك، ئالف. |
| عليقة خليط | Green meat | گۆشتە سەوزە، ئالیکێکە بریتییە لە تێکەڵاوی قەرسیل و ڕەگ و سەلکی ڕووەکی هاڕاو . |
| عليق غروي | Colloidal-bramble | قەسنی، جۆرە دەوەنێکە بەرێکی لینج دەگرێت وەك تووترك وایە دەکرێت بە دەرمان . |
| عليقية، ( ثمرة عليقية)، ثمرة متجمعة، ثمرة متضاعفة | Aggregate fruit | بەری تووترکی، بەری کۆمەڵە، کۆبەر، میوەیەك (بەرێك) لە شێوەی تووترکدا بێت. |

| | | |
|---|---|---|
| عليط، بروطية | Parrotia | پارۆتیا، دارو ڕووەکێکە گوڵی بنەوشەیی دەگرێت. |
| عليق، توت شوكي ، توت العليق، ربرق، باطس، عوسج،بالس، شوكل | Bramble, Brier, Blackberry, Rubus | دووداموک، دەلەرەسک، تولەوڕک، تووترک، تودڕی، ڕووەکێکە وەک کەپر وایە گوڵەکەی بچووک و سپی یان پەمبەیییە، بەرێکی ڕەش یان سووری هەیە وەک توو وایە، دەخورێت، بۆ مەبەستی پەرژینی باخچە دەروێنرێت. |
| عُلّيقة | Bush, Thicket | گژوگیا. |
| عليث، غليث | Maslin, Meslin | تێکەڵاوی گەنم و جۆ. |
| عُلَيّقة موسى، الجنبة المشتعلة | Burning-bush, Artillery plant | گیاموسا، گیاسووتەن، جۆرە ڕووەکێکە پەلکی گەڵاکەی سوورە. |
| عمادة | Deanery | عەمادە، پایەی یان شوێنی سەرۆکی کۆلێج یان زانکۆ. |
| عماد، عمد | Support, Prop, Pillar, Shaft | پاڵپشت، کۆڵەکە. |
| عمارة | Family, Tribe | هۆز، کۆمەڵەیەکە لە گیاندار. |
| عمارة، باوباب، تبلدي، حميرة، شجرة خبز القرود أو نسونيا | Adansonia, baobab Monkey bread, Sourgourd | باوباب، ئەدانسۆنیا، نانەمەیمون، درەختێکی مەزنە لە ناوچە گەرمەکاندا دەروێت نزیکەی ١٠ مەتر بەرز دەبێتەوە تیرەی قەدەکەی هەندێک جار دەگاتە ٨ مەتر، گەڵاکەی لە لەپی دەست دەچێت، پێنج قاشە، گوڵەکەی گەورە و ڕەنگ خاکییە، بەرەکەی شێوەی هێلکەیییە هێندەی پرتەقاڵێک دەبێت، ترش و تفتە، تۆوەکەی چەورە لە مەیانی پیشەسازی و پزیشکیدا سوودی لێوەردەگیرێت، کاکڵەی بەرەکەی دەخورێت. |
| عمارة | Building, Edifice | تەلار، باڵەخانە، سەرسەرە. |
| عمارة بحرية، أسطول | Fleet | کۆمەڵە کەشتی. |
| عمارة، آس، خنبلاس، ريحان القبور، مرسين، حمبلاس، مرد، قمام، احمام، حلموش | Myrtle, Myrtus | مۆرد، جۆرە دارو ڕووەکێکە گەلێک جۆری هەیە، گوڵی سپی یان ئەرخەوانی دەگرێت، بەرەکەی بنەوشەیی یان سوور و هەندێک جار سپییە، گەڵا و گوڵەکەی مادەیەکی چەوری بۆنخۆشی لێدەگیرێت پێی دەگوترێت (مایرتۆل) بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| عمال الفلاحة | Farm-hands | کرێکاری کشتوکاڵ (جوتیار، پاڵە، وەرزێر). |
| عمامة | Turban | مێزەر، شەدە، سەرووپێچ، شاشک. |
| عماش | Rinolophus | جۆرێکە لە شەمشەمە کوێرە. |
| عماش، اعمش | Blear-eyed, Purblind, Dim-sighted | چاوکز. |
| عماص، رَمَص، غمص | Discharge (filth) of the eye | ڕیپۆق، ڕیپۆقی چاو. |
| عُمر، سنّ | Age | تەمەن، ژیی، ژی. |
| عمر النصف، نصف العمر | Half-life | تەمەنی نیوە، ئەو ماوەیەی (کاتەی) کە بەسەر مادەیەکی تیشکدەردا تێپەڕدەبێت هەتا نیوەی ژمارەی گەردیلەکانی هەڵدەوەشێن و (شی دەبنەوە) نیوەکەی تری دەمێنێتەوە. |
| عمر عقلي | Mental age | تەمەنی ژیری، تێکڕایی زیرەکی ئەو کەسانەی کە لەیەک تەمەندان، پلەی زیرەکی کەسێک. |
| عمر زمني | Chronological-age | تەمەنی وەختی، ئەو تەمەنەی کە تێپەڕ دەبێت، لە کاتی لە دایکبوونەوە هەتا کاتی تاقیکردنەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| عمر تحصيلي | Achievement age | تەمەنی دەسکەوت، تێکڕایی ئەو پلانەی کە ئەو کەسانەی لەیەك تەمەندان وەری دەگرن لە تاقیکردنەوەیەکی تایبەتیدا. |
| عمر عظمي | Bone age | تەمەنی ئێسکی. |
| عمران، تمدن، حضارة | Civilization | ئاوەدانی. |
| عمران، بنيان | Construction, Building | خانوبەرە. |
| عمرة، قلنسوة الجذر | Calyptra, Root cap | کڵاوی ڕەگ، کڵاوی سەری ڕەگی ڕووەك. |
| عمرة، عَمر | Hand Kerchief, Head dress | لەچك، سەرپۆش. |
| عمرتان | Greater horns of the hyoid | دوو ئێسکی بچووکن لەژێر زماندا لە دیوی ناوەوە. |
| عمرس، حمل | Lamb | بەرخ. |
| عمش | Blear-eye, Dimsight | چاوکزی. |
| عمشوش، عرموش | Grapes stalk | لاسکی هێشوە ترێ. |
| عمق، غور | Depth | قووڵی، قووڵای. |
| عمق، قرارة، قامة، مقياس لعمق المياه | Bottom, Fathom | بن، ناخ، پەی، پسپۆڕی قوڵایی ئاو |
| عمق المجال | Depth of field | ناخی کایە، بنی کایە. |
| [1]عمل، فعل | Act, Action, Labour | کار، فەرمان. |
| عمل، صنع | Make, Making | پیشە. |
| عمل، شغل | Work, Business, Function, Labour | ئیش، ئەرك. |
| عمل، ممارسة | Practice | کۆشش، مەشق. |
| عملي | Practical | کردەنی، کردەیی، دەستی. |
| عمل إرادي، فعل إرادي | Voluntary action | کاری خۆویست. |
| عمل لاإرادي، فعل لاإرادي | Involuntary action | کاری خۆنەویست. |
| عمل إنعكاسي، فعل إنعكاسي | Reversible action | فەرمانی پێچەوانی. |
| عمل شعبي | Collective action | گەلکاریی، زبارە، هەرەوەز. |
| عملة، نقد | Money, Currency | دراو، پارە، پوول، دراف، کۆی ئەو پارە یاساییەی کە دەستاو دەست دەکات لە وڵاتێکدا. |
| عملة زائفة | Forged money, Counter fiet | پارەی قەڵب، پارەی درۆ، دراوی قەڵب، پارەی ساختە. |
| عملة فضية، فلوري | Silvery-money (currency) | پارەی زیوی، دراوی زیوی. |
| عملة صعبة | Hard currency | پارەی بەدەگمەن. |
| عملة ورقية | Paper money, Banknotes | پارەی کاغەز. |
| عملقة | Giantism, Gigantism | زەبەلاحیی، فیلەتەنی، کەتەیی، چەتەوڵیی، گەورەبوونی لەشی مرۆڤ بە شێوەیەکی نائاسایی. |
| عملاق، مارد | Giant | زەبەلاح، تەژە، چەتەوڵ، کەتە، نەرداو، فیلەتەن. |
| عملاق | Giant star | جۆرە ئەستێرەیەکی مەزنە. |
| عملية، طريقة | Process | ڕێگە، کردار، پرۆسە. |
| عملية جراحية | Operation, Surgery | نەشتەرگەریی، عەمەلیات، نەشتەرکاری، نەشتەرسازی. |

| | | |
|---|---|---|
| عملية ابى | | نەشتەرگەریی ئەبی، لە ڕیخۆڵەو گەروو و توورەکەی گوندا دەکرێت. |
| عملية آدم | | نەشتەرگەریی ئادەم، لە ئێسکی ڕان و پێستی بەری دەست و پێڵو و دیواری لووتدا دەکرێت. |
| عملية أسكندر | | نەشتەرگەریی ئەسکەندەر، لە منداڵدان و خوێنبەری بڕبڕەکاندا دەکرێت (بۆ چارەکردنی نەخۆشی فێ) و هەروەها بۆ دەرهێنانی پرۆستاتە. |
| عملية ألبرت | | نەشتەرگەریی ئەلبەرت، دەرهێنانی جومگەی ئەژنۆ. |
| عملية الأرتون | | نەشتەرگەریی ئەلارتۆن، بۆ دەرهێنانی بەردی میزڵدان. |
| عملية هـ ألنجهام | | نەشتەرگەریی هـ ئەلینگهام لە ڕیخۆڵە ئەستورەدا (بەشی کۆلۆن) دەکرێت. |
| عملية أموسات | | نەشتەرگەریی ئەموسات، لە ڕیخۆڵەی کۆلۆندا دەکرێت. |
| عملية أنندیل | | نەشتەرگەریی ئەناندیل، لە ئێسکی ڕاندا دەکرێت. |
| عملية أنل | | نەشتەرگەریی ئەنیل، بۆ گەورەکردنی بۆڕیی فرمێسك. |
| عملية أبولیتو | | نەشتەرگەریی ئەپۆلیتو، لە ڕیخۆڵەدا دەکرێت. |
| عملية أرليت-جاش | | نەشتەرگەریی ئەرلت-جاش، لەبرژانگی چاودا دەکرێت. |
| عملية آش | | نەشتەرگەریی ئەش، لە دیواری لووتدا دەکرێت بۆ ڕاستکردنەوەی. |
| عملية بول | | نەشتەرگەریی بۆل. لە ڕیخۆڵەی کۆلۆندا دەکرێت، هەروەها بۆ چارەکردنی قۆڕی. |
| عملية بيكر | | نەشتەرگەریی بیکەر. لە جومگەی ئەژنۆدا دەکرێت، هەروەها بۆ دەرهێنانی ئێسکی پاژنەی پێ. |
| عملية هلبن | | نەشتەرگەریی هالپین، بۆ دەرهێنانی لووی فرمێسك. |
| عملية هندي سيدز | Handysides operation | نەشتەرگەریی هاندیسایدس، لە هێلکەداندا دەکرێت. |
| عملية ترقيع البواب | Heineke-mikulicz operation | نەشتەرگەریی پینەکردنی کونی دەرگاوان، واتە کونی لای ڕاستی گەدە. |
| عملية هرزفلد | | نەشتەرگەریی هێرزفیلد، بۆ چارەکردنی شێرپەنجەی منداڵدان. |
| عملية قيصرية | Caesarean operation | نەشتەرگەریی قەیسەری، لە زگەوە منداڵ دەرهێنان، بەبێ دەرهێنانی منداڵدانەکە. |
| عملية دودلی | Dudl | نەشتەرگەریی دودلی، لە منداڵداندا دەکرێت. |
| عملية دوبلی | | نەشتەرگەریی دوپلی، بۆ چارەکردنی تەنگی زکماکی لە چووك (کێڕ)دا. |
| عملية ادبول | | نەشتەرگەریی ئێدیپۆل، پاککردنی (داتاشینی) گورچیلە بۆ چارەکردنی نەخۆشی برایت. |
| عملية دلتورو | | نەشتەرگەریی دێلتۆرۆ، لە کۆرۆنیای چاودا دەکرێت. |
| عملية دینان | | نەشتەرگەریی دینان، لە ڕیخۆڵەی براودا دەکرێت. |
| عملية ديفنباخ | | نەشتەرگەریی دێفنباخ، بڕینەوەی جومگەی ڕان. |
| عملية استلاندر | | نەشتەرگەریی ئەستلاندەر، دەرهێنانی پەراسوو. |
| عملية افربوش | | نەشتەرگەریی ئەڤەربوش، بۆ چارەکردنی داکەوتنی پێڵوو. |
| عملية فني | | نەشتەرگەریی فینی، ڕێگەیەکە بۆ گەیاندنی گەدە بە ڕیخۆڵەی دوانزەگرێ. |
| عملية فرانك | | نەشتەرگەریی فرانك، لە گەدەدا دەکرێت. |
| عملية جلبيات | | نەشتەرگەریی گالبیات، لە سێ بەندەدا دەکرێت بۆ دەرهێنانی منداڵ لە ئافرەت. |
| عملية جانت | | نەشتەرگەریی گانت، لە ئێسکی ڕاندا دەکرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| عملية جرسوني | | نەشتەرگەریی جەرسۆنی، لە ڕیخۆڵە ڕێکەدا دەکرێت بۆ چارەکردنی پیسایی ڕانەگرتن. |
| عملية جروسمان | | نەشتەرگەریی گرۆسمان، بۆ چارەکردنی جیابوونەوەی تۆڕێنەری چاو بەکاردێت. |
| عملية كبرى، عملية خطيرة | Capital operation | نەشتەرگەریی گەورە، گرنگ. |
| عملية كرنوشن | | نەشتەرگەریی کارنۆشان، بۆ چارەکردنی دەردەفیل و ئێشی دەمار (نۆرالجیا) بەکاردێت. |
| عملية شيفر | | نەشتەرگەریی شیفەر، بۆ دەرهێنانی ئالوو. |
| عملية شين | eration | نەشتەرگەریی شێن، بۆ چارەکردنی بەریەککەوتنی ئەژنۆکان. |
| عملية كلارك | | نەشتەرگەریی کلارك، بۆ پینەکردنی مەیاسیری بۆڕی میز. |
| عملية كوك | | نەشتەرگەریی کۆك، کردنەوەی بۆریی میز. |
| عملية تجميل | Cosmetic operation | نەشتەرگەریی جوانکردن، بۆ لابردنی نارێکی لە لەشدا. |
| عملية كوتنج | | نەشتەرگەریی کۆتینگ، بۆ چارەکردنی ئەو نینۆکەی کە بە گۆشتەکەدا بۆ ناوەوە گەورە دەبێت. |
| عملية كريدى | | نەشتەرگەریی کرێدی، بۆ دەرهێنانی منالْدان. |
| عملية كريل ومتي | Crile a | نەشتەرگەریی کریل و مەتی، سڕکردنی ناوچەیی لە کالانی دەماردا. |
| عملية كريب | | نەشتەرگەریی کریپ، ڕێگەیەکە بۆ کردنەوەی ڕیخۆڵەی کۆلۆن. |
| عملية دفات | | نەشتەرگەریی دڤات، بۆ چارەکردنی فراوان بوون و داکەوتنی بۆریی خوێنهێنەر. |
| عملية دافيزكولى | | نەشتەرگەریی دافیزکولی، بۆ چارەکردنی خوار و خێچی لە پێدا. |
| عملية دتل | | نەشتەرگەریی دیتل، لە پرۆستاتەدا دەکرێت. |
| عملية دويل | | نەشتەرگەریی دۆیل، بۆ چارەکردنی قۆڕی. |
| عملية بارول | | نەشتەرگەریی بارویل، بۆ چارەکردنی بەریەککەوتنی ئەژنۆکان دەکرێت. |
| عملية باسيني | | نەشتەرگەریی باسینی، بۆ چارەکردنی قۆڕیی دەکرێت. |
| عملية بيت | | نەشتەرگەریی بێت، لە بۆڕی میزدا دەکرێت. |
| عملية باتي | | نەشتەرگەریی باتی، دەرهێنانی هێلکەدان. |
| عملية بوم | | نەشتەرگەریی باوم، بەستنی دەماری دەموچاو. |
| عملية بير | | نەشتەرگەریی بیر، بۆ چارەکردنی تاریکبوونی زەرەبینی چاو. |
| عملية بجيلو | | نەشتەرگەریی بیجیلۆ، وردکردنی بەردی میزڵدان. |
| عملية بلروث | | نەشتەرگەریی بیلرۆت، بۆ دەرهێنانی کونی دەرگاوانی گەدە، دەرهێنانی زمان. |
| عملية بوب | | نەشتەرگەریی بۆب، بڕینی تورەکەی زراو و دەرهێنانی ئەو بەردانەی کەتیایەتی. |
| عملية بوبروف | | نەشتەرگەریی‌بۆبرۆف، پینەکردنی ئێسك بۆ چارەکردنی ناوبەنگی مەغزی درکاوی. |
| عملية بونزل | | نەشتەرگەریی بۆنزل، لە ڕەشێنەی چاودا دەکرێت. |
| عملية بوطيني | | نەشتەرگەریی بۆتینی، لە لووی پرۆستاتەدا دەکرێت. |
| عملية بربوير | | نەشتەرگەریی بریوێر، بۆ چارەکردنی برینی بۆریی خوێنبەر. |

| | | |
|---|---|---|
| عملية براينت | | نەشتەرگەریی بریانت، لە ریخۆڵەی کۆلۆندا دەکرێت. |
| عملية بزي | | نەشتەرگەریی بزی، پێکهاتنی بیبیلەی دەستکرد لە چاودا. |
| عملية كليسين | | نەشتەرگەریی کالیسین، لە ریخۆڵەی کۆلۆندا دەکرێت. |
| عملية البناء | Anabolism | پرۆسەی پێکهاتنی شانە لە لەشی زیندەوەردا. |
| عملية الهدم في الخلايا الحية | Catabolism | پرۆسەی تێکدان (ڕووخاندن) لە لەشی زیندەوەردا. |
| عملية الثرميت | Thermite-process | پرۆسەی تەرمیت، تەرمیتێن، پرۆسەی بەکارهێنانی تێکەڵاوی هاڕاوەی ئەلەمنیۆم و ئۆکسیدی ئاسن بۆ لەحیمکردن، هەروەها بەکارهێنانی ئەلەمنیۆم بۆ لێکردنەوەی هەندێك ئۆکسیدی کانزایی (میتاڵی) وەکو کرۆم. |
| عملية جراحية | Surgical operation | نەشتەرگەری. |
| عملية السحق، عملية السحق الحراري | Cracking-process | پرۆسەی هاڕین بە گەرمی، پرۆسەی گۆڕینی نەوتی سروشتی نەوتی قورس، بۆ بەنزین بە تێکشاندنی بە هۆی گەرمییەوە. |
| عملية التفجير | Detonation process | پرۆسەی تەقاندن. |
| عملية التبلور | Crystallization process | پرۆسەی بلووراندن، پرۆسەی بلوورێن، پرۆسەیەکە بۆ جیاکردنەوەی مادەی تواوە لە گیراوەکەی بە شێوەی بلوور وەکو لە دروستکردنی شەکردا. |
| عملية اديباتية، عملية كظيمة | Adiabatic-process | پرۆسەی ئەدیاباتی، هەر پرۆسەیەك کە ڕوودات بەبێ ئەوەی گەرمیی بدات یان گەرمیی لێوەربگرێت. |
| عملية التحميص | Roasting process | پرۆسەی برژاندن. |
| عملية التطويف | Floating-process | پرۆسەی سەرخستن، پرۆسەی سەر ئاو خستن. |
| عملية عكسية | Reversible-process | پرۆسەی پێچەوانەیی. |
| عملية الصهر | Fusion process | پرۆسەی شلەوەکردن، وەکو لە پرۆسەی پۆختەکردنی ئەلەمنیۆمدا. |
| عملية كيمياوية | Chemical process | پرۆسەی کیمیاگەریی. |
| العمليات الأربعة | | چوار کردارەکەی ماتماتیك: کۆکردنەوە و لێدەر کردن و لێکدان و دابەشکردن. |
| عملية آيزوثرومية | Isothermal process | پرۆسەی یەکسانیی گەرمی، پرۆسەیەکە پەستان و قەبارەی مادەی تێدا دەگۆڕێت بەڵام هیچ گۆڕانێك لە پلەی گەرمیدا ڕوونادات. |
| عملية عكسية، عملية إنعكاسية | Reversible-process | پرۆسەی پێچەوانەی. |
| عمه، عدم الدراية، فقد التحسس | Agnosia | حەپەسان، دەرك نەکردن، هەستکوێری، نەمانی توانای هەستکردن وەکو نەمانی توانای جیاکردنەوە لە نێوان شێوە و سروشتی شتومەك و کەسانی بینراودا. |
| عمه الذوق، عمى الذوق | Taste-blindness | چێژکوێری، چێژ نەکردن، حەپەسانی چێژ. |
| عمه الألوان | Amnesic color blindness | ڕەنگ کوێری، ڕەنگ دەرك نەکردن، حەپەسانی ڕەنگ. |
| عمه حركي | Apraxia | هەستکوێری جووڵە، پشێوییەکی ژیرییە نیشانەکەی ئەوەیە کە ئەو کەسە توانای ئەوەی نامێنێت کەمیری بکەوێتەوە چۆن هەندێك ئیشی هونەری بکات وەکو لێخوڕینی ئۆتۆمبیل. |
| عمه المرض | Anosognosia | گوێ نەدانە نەخۆشی، گوێ لێخەفاندنی نەخۆشی. |
| عمه المكتوبات، عمى القراءة | Alexia | خوێندن کوێری، نووسین کوێری. |
| عمة ذهني | Ideational agnosia | زەین کوێری، دەرك نەکردنی ڕاستی شتومەك. |
| عمهان، كلال الإدراك | Acatamathesia | دەرك نەکردنی شتومەك و هەڵوێست بە تایبەتی دەرك نەکردنی مانای قسە. |

| | | |
|---|---|---|
| عمه بصري | Visual agnosia | پشـێوی لـه توانـای جیاکردنـەوەی شـتە بینراوەکـاندا لـه ئـەنجامی نەخۆشی‌یەکەوە لە مێشکدا. |
| عمود خشبي | Wooden pillar | دیرەگ، کۆڵەکە. |
| عمود فقري | Vertebral-column, Backbone | مورغەی بڕبڕەدار، مازەی پشت، مورغەی پشت، مورەتخە، بڕبڕەی پشت. |
| عمود ، دعامة | Pillar, Post, Pole, Column | ستوون، کۆڵەکە، تان، ئەستوون، دەنگە، پایە. |
| عمود محشو | Packed column | ستوونی ئاخنراو، ستونێکە بۆ دلۆپاندن، مادەیەکی ناواخنی کونیلەداری تیادایە بۆ پترکردنی رووبەری بەر یەککەوتن لە نێوان مادەی شلە و مادەی گازدا. |
| عمودي، قائم | Vertical, Perpendicular, Columnar | ستوونی، ئەستوونی ، قیت، تانی. |
| عمود التقطير | Distillation-column | کەلووی ( بورجی) دلۆپاندن وەکو لە پاڵاوتنی نەوتی خاودا بەکاردێت . |
| عمود كهربائي | Electric-pile, Cell | بڕوانە ( خلیە کهربائیە) . |
| عمود جاف، خلية جافة | Dry-cell | پیلـی وشـك، پیلێکـی کارەبـایی وشـکە بـە ئاسـانی هـەڵدەگیرێت و بەکاردەهێنرێت وەکو لە ڕادیۆدا. |
| عمود الخزن، مرسم | Storage cell, Battery | پاتری خانەی کۆکردنەوە ، خانەی هەڵگرتن، پیلی کۆکردنەوە. |
| عمود فولتائي | Voltaic cell | پیلی ڤۆلتایی ( بڕوانە خلیە فولتائیە). |
| عمود لكلانشية | Leclanche cell | پیلی لیکلانشیْ ( بڕوانە خلیە لاکلانشیە). |
| عمود بسيط | Simple cell | پیلی سادە، پیلی ساکار. |
| عمود كهروحراري، عمود حراري، ثرموبيل | Thermopile | تێرمۆپیل، پیلی کارەبای گەرمی، جۆرە پیلێکە بۆ پێوانی پلـەی گـەرمی بەکاردێت لەو شوێنانەدا کە تەرمۆمیتری تیادا بەکارنایەت. |
| عمود الوقود | Fuel cell | خانەی سووتەمەنی، پیلی سووتەمەنی، پیلێکی کیمیایی کارەبای‌یە وزەی کیمیـایی ئـەو ستووتەمەنی‌یەی کە بەردەوام تـیْی دەکرێـت دەگۆڕێـت بـۆ وزەی کارەبایی. |
| عمود إبتدائي | Primary pillar | پیلی سەرەتایی. |
| عمودالتلفون، عمود الكهرباء | Post | دارتەل، عەمودی کارەبا . |
| عمود الحفر | Drilling rod, Boring rod | ستوونی هەڵکەندن، ئەو ستوونەیەکە مەکینەی هەڵکەندن دەیسوڕێنێتەوە . |
| عمود الخيمة | Tent pole | کۆڵەکەی چادر. |
| عمود القنطرة | Pier of a bridge | پایەی پرد. |
| عمود التجزئة، برج التجزئة | Fractional-column | کەلووی بەشکردن، بورجی دلۆپاندنی بەشکردن لە پاڵاوتنی نەوتی خاودا بەکاردێت، نەوتە سروشتی‌یەکە دەکات بە ڕۆنی مەکینە و گازۆیل و نەوتی سپی و بەنزین . |
| عمولة، جعالة | Commission | قومیسیۆن،ئەو پارەیەی کە دەڵاڵێك یان بانقێك وەریدەگرێت بەرامبەر بە ئیشێك. |
| عمولة | Percentage | دەڵاڵی، کرێیەکی ڕێژەی‌یە ئەو کەسە وەریدەگرێت کە ئیشێکی بازرگانی یان زەوی و زاری پێسپێرابێت. |
| عمى، كمه | Blindness, Ablepsia | کوێری، کوێرایی، چاوداهاتن، سۆما داهاتن. |
| عمى نصفي | Hemiano psea | نیوە کوێری چاو. |
| عمى الألوان، دالتوانية | Colour blindness, Daltonism, Achromatopia | ڕەنگ کوێری، بە هۆی ڕانەهاتن لەسەر هەستکردن بە ڕەنگ، دوو جۆری هەیە یەکێکیان ناتوانێت ڕەنگی سوور ببینێت، ئەوی‌تریان ڕەنگی سوور و سەوز لە یەکتری جیاناکاتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| عمى الألوان الجزئي | Partial colour Blindness | ڕەنگ کوێری ناتەواو، نەتوانینی چاو لە جیاکردنەوەی ڕەنگی سوور ئینجا شین ئینجا زەرد یەك لە دوای یەك. |
| عمى الألوان العام | Achromation | ڕەنگ کوێری گشتی. |
| عمى الألوان الكلي، عمى الألوان الكامل | Complete colour Blindness, Achromatopsia | ڕەنگ کوێری تەواو، هەموو ڕەنگەکان سپی دەبینێت بە پلەی جیاواز لە تین ( شدە) دا . |
| عمى غير مكتمل ، دوش، عمى جزئي | Obcecation, Meropia | کوێری ناتەواو، کوێری بەشی. |
| عمى الغسق | Aknephascopia | کوێری ئێوارە وەختە، کوێری شێوان، شێوکوێری . |
| عمى وظيفي | Functional blindness | کوێربوونی فەرمانی ، فەرمان کوێری، نەتوانینی بینین هەرچەند کە چاویشی ساغ بێت. |
| عمى البنفسجي | Amianthopy | کوێرەبنەوشەیی، بنەوشەیی کوێریی، نەبینی ڕەنگی بنەوشەیی. |
| عمى الحمرة، عمى اللون الأحمر | Red blindness, Protanopia Protanopsia | کوێرسووری، سوور کوێری، نەبینینی ڕەنگی سوور. |
| عمى الأخضر، عمى الخضرة | Achloropsia, Achloroblepsia, Deuteranopia, Aglaucopsia, Aglaukopsia, Green blindness | کوێرسەوزیی، سەوزکوێری ، نەبینینی ڕەنگی سەوز. |
| عمى الأزرق، عمى الزرقة | Acyanoblepsia, Acyanopsia, Tritanopsia, Blue blindness | کوێرشین، شین کوێریی، نەبینینی ڕەنگی شین. |
| عمى وقتي | Temporary-blindness | کوێری کاتی، وەك لە کاتی جەنگدا ڕوودەدات. |
| عمى البصيرة، عمى روحي او عقلي | Mind blindness, Psychic-blindness | دەروون کوێری، ئەو کەسە بە ڕواڵەت دەبینێت بەڵام شتومەك لە یەکتری جیاناکاتەوە و تێیان ناگات . |
| عمى الكلمات | Aphasia, Alexia | وشەکوێری، خوێندنەوەکوێری. |
| عمى الحروف | Letter blindness | پیت کوێری. |
| عمى القمر، قَمَر | Moon blindness | مانگ کوێری، ئەوکەسە کە سەیری مانگ بکات چاوی نابینێت. |
| عمى الثلج، قَمَرٌ | Snow blindness | بەفر کوێری، ئەو کەسە لە بەفردا چاوی نابینێ، نەبینین بەهۆی ئەو ڕووناکییە بەتینەی کە دەکەوێتە سەر بەفر . |
| عمى الليل، عشا، عشو | Night blindness, Hemeralopia-nyclalopia | شەوکوێری، زڕەکبوون. |
| عمى النهار، جهر، خفش | Day blindness | ڕۆژکوێری، قارغی. |
| عمياء | Blind woman | ژنێکی کوێر. |
| عمى خذني معك، راس الحمامة، ارقطيون | Burdock, Arctium | سەرەکۆتر، ڕووەکێکی دڕکاویی پزیشکییە، قنچکی بەرەکەی قولاپدارە، دەنووسێت بە لەشی گیاندار و شتومەکەوە. |
| عميرة، منحلة | Shed of bess, Apiary | شوێنی پەروەردەکردنی هەنگ، کۆمەڵێك شانەی هەنگ. |
| عميد، رئيس | Chief, Principal | سەرۆك. |
| عميد بحري ( في الأسطول) | Rear admiral | میری زەریا، عەمیدی زەریا، زەریا سالار. |
| عميد النخل | Archonto-phoenix | سەرۆکی دارخورما، درەختێکە لە کۆمەڵەی دارخورمایە. |
| عميد الكلية او الجامعة | Rector, Dean | سەرۆکی زانکۆ یان کۆلیج. |
| عمير، عامر، آهل | Populus | ئاوەدان. |

| | | |
|---|---|---|
| عميرة، تحت قبيلة | Subtribe | ژێرهۆز، بەشێکە لە پۆلەکانی زیندەوەر. |
| عميق | Deep, Profound | قووڵ. |
| عميل، وكيل | Agent | وەکیل، بەکرێگیراو. |
| عميل، زبون، مشتري | Customer | مەعمیل. |
| عُنازٌ، لقلق حبشي | Ethiopian-stork | لەقلەقی حەبەشە، ڕەنگەکەی ڕەش و مەیلە و ئەرخەوانییە ، سکی سپییە و سەربالی ڕەشە، مل و دەنوك و لاق سوورە لە حەبەشە دەژی. |
| عنّاز | Lily grass | گیازەمەق، زەلی گوڵدار، ڕووەکێکە گوڵی جوان دەگرێت. |
| عنار، ذو الأعنة، ممسك الأعنة | Flowering rush, Auriga, The charioteer | جڵەوبەدەست، جڵەودار، بزنەوان، شوانی بزن، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| عناق | She-kid | سیاگوش، سیولۆ، گوێ ڕەش، ووشەك، هەنگوینخۆر، جۆرێکە لە پشیلەکێوی. |
| عناق الأرض، عنجل، خنجل، فرانق، تُفة، وشق صحراوي | Caracal, Persian-lynx | گیاندارێکی درندەیە لە کۆمەڵەی گوربە لە پشیلە گەورەترە و تۆپەڵە موویەکی ڕەش وا بەسەر گوێچکەیەوە ڕەنگەکەی خاکی یان قاوەیی مەیلە و سوورە، سکی سپییە. |
| عناق | Mizar | کارژۆڵە، سیاگوش، جۆرە ئەستێرەیەکە. |
| عناق، معانقة | Embracing | دەست لەملکردن، دەست لەملان. |
| عناقية، قضاب، ونكا | Periwinkle, Vinca | ڤینکا، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی ژاڵە، هەندێکی وەك کەپر وایە، گوڵێکی شینی گەورە دەگرێت، هەندێکی تری گوڵی سپی یان پەمەیی دەگرێت . |
| عناية | Attention, Care | خەمخۆری ، چاودێری ، بە تەنگەوەهاتن، بەتەنگەوەبوون. |
| عناية زراعية | Tending | چاودێری کشتوکاڵ و دارستان . |
| عُنّاب | Jujube tree, Zizyphus-jujuba | عەناب، عەنەب، دلیق، درەختێکە لە کۆمەڵەی تاوگە و وەکو شیلان سوورە و کەمێ درێژکارە، وەکو خورما یان زەیتون وایە ، سوور و شیرینە بۆ خواردن و دەرمان بەکاردێت، دارەکەشی بەرز و دڕکاوییە و گوڵەکەی بچووك و زەردە. |
| عناب بّري، سدر البّر، ضاّل | Wild jujube, Lotus jujube | عەنابە کێویلە، درەختێکی دڕکاوییە، بەرەکەی بچووك و عەنابی و خۆشە بۆ نەخۆشی سنگ باشە. |
| عَنّاج، نمرية | Tingida, Tingis | مێرووەپڵنگی، مێروویەکی زیان بەخشە بە ڕووەك لەسەر گەڵای درەخت کۆمەڵ دەبەستێت و لەناوی دەبات . |
| عِناج، ألم القطن | Lumbago | ڕەقیتە، ئازاری خالیگە. |
| عناكب، رتيلاوات | Araneida | جاڵجالۆکەییەکان، کۆمەڵەی جاڵجالۆکە. |
| عنوان | Address, Title, Heading | ناونیشان، سەرباس، سەرناو. |
| عناصر | Elements (chemical) | توخمەکان، توخم یەك مادەیە بە ڕێگە ئاساییە زانراوەکان مادەی تری لێدەرناهێنرێت وەکو ئاسن. |
| عناصر إنتقالية | Transition-elements | توخمە گواستراوەییەکان، ئەو توخمانەن کە هەموویان کانزان و دەکەونە سێ خولەوە لە خشتەی خولیدا، لە خولی یەکەمدا لە سکاندیۆمەوە ٢١ بۆ مس ٢٩، لە دووەمدا لە ییتەریۆمەوە ٣٩ بۆ کادمۆیم ٤٧، و لە سێهەمدا لە لانتانۆمەوە ٥٧ بۆ زێر ٧٩ واتە توخمە لانتانیدەکان ، هەروەها ئەو توخمانەی کە دەکەونە دوای ئەکتینیۆم ٨٩، توخمە گوستراوەییەکان باری ئۆکسانی جیاوازیان هەیە و چەندەها ئایۆنی ئالۆز پێکدەهێنن و ڕەوشتی بەنرخیان هەیە لە باری کانزاییدا. |

| عربي | English | کوردی |
|---|---|---|
| عناصر مشعة، عناصر ذات نشاط إشعاعي | Radioactive-elements | توخمە چالاك تیشكدەرەكان، ئەو توخمە سروشتییە یان دەستكردانەی كە ناوكەكانیان لێهەڵدەوەشێن و وزەیان لێدەردەپەڕێت بە شێوەی تیشكی ئەلفا و بێتا یان گاما و بە قورقوشم كۆتاییان دێت، بڕی مادە تیشكدەرەكان بە یەكەی چالاكی تیشكدانەوە واتە تێكڕایی خێرایی لێكهەڵوەشان بە یەكەی ( كووری) دەردەپەڕێت، كە ئەویش بریتییە لە ٣/٧٣x١٠$^{١٠}$ لێكهەڵوەشان لە چركەیەكدا ، نموونەش بۆ ئەم توخمانە یۆرانیۆم، ڕادیۆم هتد كە لە مەیانی زانست و پیشەسازی و كشتوكاڵ و تەندروستی هتد سوودیان لێوەردەگیرێت . |
| عناصر لانثانية، عناصر لانثانيدية، سلسلة اللانثانيدات | Lanthanides, Lanthanoid-series | توخمە لانتانیدەكان، زنجیرەی لانتانیدەكان بریتییەلە زنجیرەی توخمە گڵییە دەگمەنەكان لە ژمارەی گەردیلە بێ یان لە توخمی سیریۆمەوە ٥٨ دەست پێدەكات هەتا توخمی لۆتیتیۆم ٧١. |
| عناصر اكتينية، عناصر اكتينيدية، سلسلة الأكتينيدات | Actinide- series, Actinoid- series | توخمە ئەكتینایدەكان، زنجیرەی ئەكتینایدەكان ، بریتییە لە كۆمەڵەی توخمە چالاك تیشكدەرەكان كە لە توخمی ئەكتینیۆم ٨٩ وە دەست پێدەكات هەتا توخمی هاهنیۆم ١٠٥، هەموویان كانزان و هێشتا لە ژێر تاقیكردنەوەدان بۆ زانینی سوودەكانیان . |
| عناصر وراء اليورانيوم | Transuranic-elements | توخمە ترانسۆرانییەكان، توخمەكانی دوای یۆرانیۆم، ئەو توخمانەی كە ژمارەی گەردیلەییان لە هینی یۆرانیۆم زیاتر و لە سروشتدا نەبینراون و بە بۆردومانكردنی ناوكی دروستكراون، هەموویان چالاكن لە تیشكدانەوەدا و تازەترینیان بریتییە لە توخمی هاهنیۆم. |
| عناصر ممثلة، عناصر نموذجية | Representative elements | توخمە نوێنەرەكان، توخمە نموونەییەكان ، ئەو توخمانەی كە تەنها یەك جۆر ( ژمارە) هاوهێزیان هەیە لە ئاوێتەكانیاندا وەكو توخمەكانی خێزانی (ا ) لە كۆمەڵەی یەكەم و دووەم لە خشتەی خولیدا واتە وەكو سۆدیۆم و كالیسۆم..هتد. |
| عناصر خاملة، غازات خاملة، عناصر نادرة، غازات نادرة، عناصر نبيلة، غازات نبيلة | Rare-gases | توخمە دەگمەنەكان، گازە دەگمەنەكان، توخمە سستەكان، گازە سستەكان، بریتین لە شەش گاز كەوتوونەتە كۆمەڵەی ئەوپەڕی لای ڕاستی خشتەی خولی، ناوەكانیان : هیلیۆم، نیۆن، ئارگۆن، كریپتۆن، زینۆن، ڕادۆن، سیانەكەی یەكەمیان بە ڕاستی سستن، بەڵام ئەوانی تریان هەتا ڕادەیەكی كەم لە توانایاندا هەیە ئاوێتە دروست بكەن. |
| عناصر الغذاء، عناصر أساسية | Nutrient or essential elements, Nutritional factors | توخمەكانی خۆراك، توخمە سەرەكییەكان، بریتین لە ترشە ئەمینییەكان و ترشە چەورییەكان و ڤیتامینەكان واتە بنچینەی ئەو خۆراكەی كە پێویستن بۆ گەورە بوون و گەشەكردنی لەشی زیندەوەر ( گیاندار و ڕووەك). |
| عناصر ترابية نادرة، عناصر أرضية نادرة | Rare-earth-elements | توخمە خولییە دەگمەنەكان، توخمە گڵییە دەگمەنەكان، كۆمەڵە توخمێكی كانزایین و لە یەكتری دەچن لە ڕووی ڕەوشتی كیمیاییەوە و ژمارەیان پانزەیە واتە لە نێوانی ژمارەی گەردیلەیی ( ٥٧ لانتانۆم-٧١ لۆتینۆم/ لە كۆمەڵەی سێهەم لە خشتەی لانتانیدەكان. |
| عنانة، عنّة، عجز جنسي، حوقلة | Sexual impotence, Asynodia, impotence, Impotency | بێكارەیی ڕەگەزی، ئەمانی ئاڵۆشی ڕەگەزی، نەتوانینی جوتگرتن، پشتشلی ، كەموكوڕییەك لە كۆئەندامی دەماریی یان كۆئەندامی زاوزێدایە كە ناهێڵێت ئەو گیاندارە چووكی هەستێت و كرداری جووتگرتن جێبەجێبكات. |

| | | |
|---|---|---|
| عنان، سير اللجام، رسن، شكيمة | Bridle, Reins | جلەو، ڕەشمە، دەستەجلەو. |
| عنان، سحاب | Cloud | هەور. |
| عناد | Opposition | سەرکێشی، سەرچڵی، ورك، مانگرتن، خرسی، لاساریی، گەی، مان . |
| عنب | Grapes | تریێ، هەنگوڕ، بەری داری مێو کە بە شێوەی هێشووە، جۆرەکانی : ڕەشکە، سپیکە، کشمیشی ، دۆشاویی، سایانی، ڕەشمیری، سەرقوڵە، پایزە، تامخۆرووس، تایەڤ، تۆرتۆر، تەورێزی، جافیکایی، خۆشناو، دڵەکەلەشێر، زلکە، ناوەبڕ، زوومرەو، سوورەشلی، پووسەڵ، تریبکە. |
| عنب أسود، غربيب | Black grapes | تریێ ڕەشە، چەمچڕ، یەکێکە لە جۆرەکانی تریێ. |
| عنب صيفي | Summer grapes, Pigeon grapes | تریێ هاوینە، جۆرێکە لە تریێ ڕەشکە بەرەکەی شیرین یان مەیلە و ترشە. |
| عنب نصف ناضج، حصرم | Green sour-grapes | بەرسیلە، تریێی پێنەگەیشتوو. |
| عنب مسكي | Muscadine grapes | تریێی بۆنخۆش، تریێی تامخۆش. |
| عنب الذئب، ربرق | Garden-night-shade, Black night shade | تریێی گورگ، دەوەنێکی تەمەن درێژە لە کۆمەڵەی بایەنجانە، قەدەکەی ئەستوور و دڕکاوی‌یە ، گەڵاکەی گەورەیە، گوڵەکەی بنەوشەیی‌یە، بەرەکەی وورد و خڕو ڕەشە ناخورێت، ئەگەر لەگەڵ بایەنجان موتوربە بکرێت بەرەکەی دەخورێت . |
| عنب النبيذ و العصير | Wine and juice-grapes | تریێی شەرابی و شەربەت. |
| عنب المائدة، عنب التفكة | Table grapes, Dessert grapes | تریێی خواردن. |
| عنب الغراب، صخرية | Black-berried-heath, Crow-berry | تریێی قەڵەڕەشکە، دەوەنێکی پزیشکی‌یە گوڵەکەی سوورە ، بەرەکەی ڕەش و توونە دەخورێت . |
| عنب النصاري، كشمش احمر | Red currant | تریێی کشمیشی سوور. |
| عنب الثعلب، مغد اسود، ثلثان | Morel, Black night-shade, Solanum nigrum | تریێی ڕێوی، گیایەکە لە کۆمەڵەی بایەنجانە هەندێك جۆری مادەی سڕکەری تێدایە . |
| عنب الزبيب | Raisin grapes | تریێی مێوژ. |
| عنب الحجال | Partidge-berry | تریێی سوێسکە، ڕووەکێکە بەرەکەی لە تریێ دەچێت، سوورە و دەخورێت، گوڵەکەی سپی مەیلە و ئەرخەوانی بۆنخۆشە. |
| عنب الثعلب، فناة | Bitter-sweet, Fox grape, Woddy night-shade, Night-shade, Felon wood, Felon-wort | تریێی کێویلە، تریێی ڕێوی، توولەزەرە، ڕێزەڵە، هەرمزاڵە، ڕووەکێکە بەرەکەی لە تریێ دەچێت ، سوور و ووردە بەشێوەی هێشوو ، گیایەکی دەشتەکی پزیشکی‌یە لە کۆمەڵەی زەمق لەناو لەوەڕگادا دەڕوێت، ڕەگەکەی ڕشێنەرەوەیە مادەی سڕکەر لە گەڵاکەی دەردەهێنرێت . |
| عنب الثعلب، عجد، ريباس | Ribes, Flowering-currant | تریێ ڕێوی، کشمیشی گوڵدار، ڕووەکێکە هێشوە گوڵی پەمەیی دەگرێت . |
| عنب الحية، فاشرا سوداء | White-bryony, White-vine, Snake-bryony | تریێ مارانە، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی کولەکە لەناو دارستان و شوێنە بەیارەکاندا دەڕوێت گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویەکی سپی مەیلە و سەوزە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت . |

| | | |
|---|---|---|
| عنب شاطىء البحر | Coccoloba | تریّی قەراغ دەریا، درەختێکە لەناوچە گەرمەکانی ئەمریکا دەڕوێ. |
| عنب الدُب، عیسران، اویسة | Bear-berry, Bilberry, Whortle berry | تریّی ورچ، ڕووەکێکە لەناوچە شۆرەکاتەکاندا دەڕوێ، مازوو دەگرێت بۆ دەباخکردن و دژی سکچوون بەکاردێت، بەرەکەی ڕەشە یان سوورە لە تریّ دەچێت و ورچ دەیخوات ، گوڵەکەی پەمەییە . |
| عنب القطا، غلطارية كندية | Checker-berry, Winter-green | تریّی قەتێ، دەوەنێکە گوڵەکەی سپییە، گەڵاکەی بۆنخۆشە وەکو چایی بەکاردێت و سوودی پزیشکی هەیە ، سەلکەکەی دەخورێت. |
| عنب الهند، ببايا، بباظ | Papaya, Papawapple, Melon tree | پاپایا، سێوی پاپاو، دارکاڵەك، درەختێکی ناوچە گەرمەکانە گەڵاکەی لە لەپی دەست دەچێت گەورەیە، گوڵەکەی ڕەنگ فستقییە، بەرەکەی لە هەڵوژە دەچێت، بەڵام هێندەی کاڵەکێك دەبێت، شیینە و دەخورێت . ئاوکێکی سپی لێدەردەهێنرێت و پیّدەگوترێت زەمقی پاپایا. |
| عنب الصحراء | Desert-grapes | هەزارومشێنە، هەزارومشان، تریّی بیابانی، ڕووەکێکی لاولاوییە، بەرەکەی لە تریّ دەچێت دەباخی پیّدەکرێت . |
| عنب محفوظ، | | مێلاق |
| عنبا، منغو، منجو، منغا، منجا، انبج، عنبة | Mango | عەمبە، مانگۆ، مانگ، درەختێکە گوڵەکەی بە شێوەی هێشوییەکی سوورە، بەرەکەی لە گورچیلە دەچێت، گەورەیە و نزیکەی کیلۆیەك دەکێشێت، ڕەنگەکەی سەوزی مەیلەو زەردە یان سوورە دەخورێت و دەکرێت بە مرەبا بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت . |
| عِنبِّية | Blue-berry, Vaccinium | تریّی شینکە، دەوەنێکە بەرەکەی وەك دەنکە تریّیەکی بچووك وایە ڕەنگەکەی ڕەش و مەیلەو شینە، تامەکەی خۆشە لە بێشەڵانەکانی ئەوروپا و ئەمریکادا دەڕوێ. |
| عنبية ( ثمرة) | Berry | تریۆکە، هەر بەرێکی ڕووەك گۆشتن بێت و دەنکی تیا نەبێت بەڵام چەند تۆوێکی تیابێت لە تریّ بچێت . |
| عنبة | Acinus, Acini | بۆڵیی، هەر شتێك لە بۆڵەتریّ بچێت. |
| عِنَبة | Ambury, Anbury | دوومەڵێکی نەرمە لە لاقی وڵاخ و ئاژەڵ پەیدا دەبێت . |
| عنب اُريجون، برباريس، انبرباريس، عود الريح | Berberis, oregon-grape, Barberry | زریشك، ڕووەکێکە گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی زەردە، بەرەکەی ئەرخەوانیی مەیلە و ڕەشە. |
| عنبر، حوت العنبر، قيطس، حوت المنّ | Sperm-whale, Physeter, Cachalot | نەهەنگی عەمبەر، جۆرە نەهەنگێکی گەورەی سەرزلە، ڕەنگەکەی خۆڵەمێشییە و ددانی هەیە . |
| عنبر، مخزن | Store-house, Ware house | هۆڵی خستەخانە و کارگە و بەندیخانە، عەماری دەغڵودان، گەنجینەی دەغڵودان، عەمار، هەمار. |
| عنبر محروق | Burnt umber | عەبەری سووتاو، بۆیەیەکی شینەلە عەبەر دروست دەکرێت ، بریتییە لە ئۆکسیدی ئاسن و مەنگەنیز. |
| عنبر | Corn-flower | ڕووەکێکی ساڵانەیە گوڵی شین و سوور یان سپی هەیە |
| عنبر، كهرباء، كهرمان | Amber,Succinum | عەمبەر، کارەبا، مادەیەکی ڕێسینی بووبەردە، چەند ڕەنگێکی هەیە بە تایبەتی زەردی هەنگوینی لە ڕێسنی درەختی سنەوبەر پەیدابووە لە کانەکانی خەڵوز دەردەهێنرێت . |

| | | |
|---|---|---|
| عنبر، عنبر خام | Amber, Amber gris | عەمبەر، مادەیەکە بە چەند ڕەنگێك هەیە بە تایبەتی سپی یان زەرد لە مۆم دەچێت، ڕیخۆڵەی نەهەنگی عەبەر دەریدەدات و بۆنی مسکی لێدێت لەسەر ڕووی دەریای وڵاتە گەرمەکاندا دەبینرێت ، بۆ چارەکردنی نەخۆشی تا و دەمار هەروەها بۆ دروستکردنی عەتر بەکاردێت . |
| عنبرة الشتاء | Depth of winter | چلەی زستان . |
| عنبربوی، عنبر بول، حب المسك، خطمي مسكي | Abelmosk, Musk okra, Musk mallow | عەبەربۆ، هێرۆی بۆنخۆش، تۆڵەکەی بۆنخۆش، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی تۆڵەکەیە، گەڵاکەی گەورە و زەردە، بەرەکەی لوولەییە، دەنکەکەی خڕ و بۆنخۆشە، عەتری لێدروست دەکرێت. |
| عنبر، عمبر | | جۆرێکە لە برنج. |
| عنبر المستشفى او السجن | Section, Ward | بەشێك لە خەستەخانە یان بەندیخانە. |
| عنبر دماغ، شجرة الميعة | Sweet gumtree, storax, Satin walnut tree | عەمبەری جەوی، درەختێکە گەڵاکەی گەورەیە لە گەڵامێو دەچێت، بەرەکەی ورد و باڵدارە بە قلیشاندنی توێکڵی قەدەکەی جەوییەکی بۆنخۆش دەستگیر دەبێت کە بۆ بەهێزکردنی ئاڵۆشی ڕەگەزیی بەکاردێت. |
| عُنة | | بڕوانە (عنانە). |
| عُنة الانثى | Female-impotence | بێکارەیی ڕەگەزیی لە مێدا، نەمانی ئاڵۆشی جوتگرتن لە مێ (ژن)دا. |
| عُنة وظيفية | Functional impotence | بێکارەیی ڕەگەزیی فەرمانی، بەهۆی باری نائاسایی دەروونییەوە دەبێت. |
| عُنة الذكر | Male impotence | چووك هەڵنەسان، بێکارەیی ڕەگەزیی لە نێردا. |
| عُنة عضوية | Organic impotence | بێکارەیی ڕەگەزیی ئەندامی، کە بەهۆی نەخۆشیی ئەندامییەوە دەبێت. |
| عنتر، عنترية | Robber fly, Hornet fly | مێشە دزە، مێشێکی گەورەیە جۆرە مێرووێکی دڕندەی سوود بەخشە چونکە مێرووی زیانبەخش لەناو دەبات. |
| عنتري، صدار | Corsage, Bodice | سوخمەی کراس. |
| عنتر | Ape (male) | عەنتەر، مەیموونی نێرەی قنگ سوور. |
| عنبري | Liqueur, Acordial | جۆرێکە لە مەی، شیرینە. |
| عُنجد | Raisin | مێوژ، کشمیش. |
| عنجاص، اجاص، برقوق | Plum | هەڵوژە، هەڵووچە، گەراس، گەلاس. |
| عنجول، عنجل | Gelechida | جیلیچیدا، پەپوولەیەکی زیانبەخشە بە ڕووەکی پەتاتە و دەغڵودان و لۆکە. |
| عنجوس، حالوش، مالوش | Male cricket | مڵە، جۆبرکە، مێروویەکی قاوەیی گەورەی زیانبەخشە بە ڕووەك، بەزۆری لە باخچەدا دەژی. |
| عنجد، شولة، بيضاء، لبانة مغربية | Euphorbium, Gum-plant | جۆرێکە لە ڕووەکی شیرمار، شیراوەکەی زۆر ژەهرین و بەکارە. |
| عنجد جميل، بنت القنصل | Flame leaf | کچە کۆنسوڵ، جۆرێکە لە شیرمار، گوڵی ئەستێرەیی گەورەی ئەرخەوانی دەگرێت. |
| عنجيل | Trachy pterus | تراچیپیترە، جۆرە ماسییەکی دەریاییە، پەرەکەکەی لە باوەشێن دەچێت و پەرەکەی کلکی قیتە. |
| عندليب، هزار، صفرد، ابوالمليح | Nightinagle | عەینەمەل، هوزار، جۆرێکە لە بولبول، بەشی سەرەوەی لەشی قاوەیی و مەیلەو سەوزە، خوارەوەی سپییە، کلکی قاوەیی کاڵە، کوللەخۆر. |
| عندليب، آكل الجراد | Berry eater | غەزایی، تووەخۆرە، غاینەمەل، پەلەوەرێکە وەکو کەنەسمەیە، ڕەنگاو ڕەنگ و مێملی کوللەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| عَنْدَم، فوفلة، بقم هندي، دم الأخوين، دم التنين، القاطرالمكي | Brasil-wood, Lima wood, Divi-divitree, American sumach, Bukk-wood, blood | درەختی خوێنی دووبراکە، بەقەم، درەختی ئاژدیها، درەختێکی درکاوییە، گەڵاکەی ئاوێتەیە و گوڵەکەی زەرد یان پرتەقاڵییە، تەختەکەی ئایابە، ڕەنگی سوور یان زەردی لێدەردەهێنرێت بۆ ڕەنگ کردن. |
| عنزع | Lovegrass, Tickle grass | گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵودانە بۆ لەوەڕ باشە. |
| عَنْز، ماعز، تيس | Goat | بزن، ئەلوری، سیاوەن. |
| عنز (ذكر) | Goat (male) | سابرێن، بزنی نێر. |
| عنز جبلي، بدن، وعل | Mountain goat, Wild goat | بزنە کێوی. |
| عنز الماء، قادوح، فنفر | Balistes, Trigger-fish | ماسییە پەلەپیتکە، ماسییەکی پانکەڵەیە سەری پەڕەکەی مامزەی پێوەیە. |
| عنز هندي، ابوسعن | Marabou | مارابو، بزنی هیندی، باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی لەقلەق تورەکەیەکی هەیە لەژێر ملیدا. |
| عنز الماء، ابومنجل، حارس | Ibis, Black-stork | لەقلەقی ڕەش، باڵندەیەکی ئاوییە مل و لاقی درێژە. |
| عنزروت، قداد، اسطراغالوس، كثيراء، مخلب العقاب، قتاد الصمغ، شجرة القدس، استراغالس | Astragallus sarcocolla, Milk vetch | ئەستراگالەس، کووژە، گەوەن، ڕووەکی کەتیرە، کۆمەڵە گیا و دەوەنێکی دەشتەکییە گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویەکی سپی یان زەرد یان بنەوشەیی یان سوور، بۆ مەبەستی پزیشکی یان دەرهێنانی کەتیرە بەکاردێت، نزیکەی چل جۆری هەیە. |
| عنزب، سماق اللك | lac sumach | سماقی لۆك، جۆرێکە لە داری سماق، لۆك لە قەدەکەی دەردەهێنرێت. |
| عنس، عانس | An old maid | گەورەکچ، کچێکی گەورە کە شووی نەکردبێت. |
| عنس | Audax | داڵ، سیسارکەکەچەڵە، پێشەخۆرە، داڵێکی گەورەیە ڕەنگەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە و دەنووك و نینۆکی زەردە. |
| عنش | Polydactylia, Sexdigitism | شەش پەنجەیی، بوونی شەش پەنجە لە دەست یان پێدا. |
| عنصر | Wild goat | بزنە کێوی. |
| عنصر | Element | توخم، ڕەچەڵەك، نەژاد. |
| عنصر كيميائي | Chemichal-element | توخمی کیمیایی، تەنها مادەیەکە و مادەی تری بە ڕێگەی ئاساییە زانراوەکان لێدەر ناهێنرێت، وەکو ئاسن. |
| عنصر ١٠٤، رذرفورديوم | Element 104, Rutherfordium | توخمی (١٠٤)، ڕەزەرفۆردیۆم، توخمێکی دەستکردە لە ساڵی ١٩٦٩ دا دۆزرایەوە، ژمارەی گەردیلەیییەکەی (١٠٤)ە و کێشی گەردیلەکەی (٢١٦)ە و نیشانەی (RF)ە. |
| عنصر ١٠٥، هاهينوم | Element 105, Hahnium | توخمی (١٠٥)، هاهنیۆم، توخمێکی دەستکردە ژمارەی گەردیلەییەکەی (١٠٥)ە و کێشی گەردیلەکەی (٢٦٠)ە و بە ناوی زانای ئەڵمانییەوە (ئۆتۆهان) ناونراوە و نیشانەی (Ha). |
| عنصر، جنس | Race | ڕەگەز، ڕەچەڵەك، نەژاد. |
| عنصري | Elemental | توخمی، ڕەگەزیی، ڕەچەڵەکی، نەژادی. |
| عنصل، إشقيل، عنصلان، بصل الفار، عيسلان، بصل الحية، بصل بريّ، عنصلاء | Squil, Scilla, Sea onion, Sisyrinchium, Iris | جافڵقێنە، پیازەمشکانە، سەلکی کاردو، پیازە خوگانە، پیازە مارانە، قوڕاوە، ڕووەکێکی پیازییە لە کۆمەڵەی زەمەق، گەلێك جۆری هەیە، گوڵەکەی بە زۆری شینە و هەندێ جار سپی یان سوورە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| عنصيف | Blue Dasiy, Blue Marguerite | دێزی شین، مارگرێتی شین، ڕووەکێکە گوڵی شینی جوان دەگرێت بۆ ڕازاندنەوە بەکاردێت . |
| عنظوب | Stagbettle | جۆرە مێروویەکی بەسوودە، لە قالۆنچە دەچێت، ڕەنگەکەی ڕەش یان قاوەییە لەژێر توێکڵی درەختدا دەژی. |
| عنظل | | بڕوانە ( عكاشە). |
| عنف | Violence, Harshness, Severity | توندی، توندوتیژی. |
| عنفة، ريشة المروحة | Vane, Blade | پەڕەکەی پانکە. |
| عنفة | Turbine | تۆربین، چەرخی ئاو. |
| عنفط | | بڕوانە ( عناق الارض) . |
| عنفوان، ريعان، ميعة، شرخ | Prime, Youth | هەرەت، تاف. |
| عنق | Neck, Cervix, Collum | گەردن، مل، ئەستۆ، ستوکر، ستۆ. |
| عنق الرحم | Cervix, Uteri | ملی مناڵدان، لقی مندالأن. |
| عنقي | Cervial | ملی، هەرشتێك پەیوەندی بە ملەوە هەبێت . |
| عنق السنّ | Dentis collum | ملی ددان، باریکایی ددان . |
| عنقاء، فتقس، سمندل | Griffon, Griffin, Fabuiousbird | سیمرخ، هۆما، باڵندەیەکی ئەفسانەییە، بەڵام ئێستا بە جۆرە کەڵەشێرێکی یابانی ڕەنگین دەگوترێت . |
| عنقاء | Phoenix | جۆرە ئەستێرەیەکە . |
| عنقب، فاصوليا مهمازية | Centrosema | ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی فاسۆلیا بۆ لەوەڕ باشە. |
| عنقد | Beryx | بیرایکس، ماسییەکی دڕکاوی ڕەنگینی بچووکی چاو گەورەیە. |
| عنق الورقة | Peduncle, Petiole, Rachis | تلاسکی گەڵا. |
| عنقود | Bunch, Raceme, Cluster | هێشوو، خزلیك، بووڵ، ئێشی، هۆشە. |
| عنقودي | Acinous, Racemose | هێشوویی. |
| عنقود زهري | Panicle | شکۆفەی گوڵ، هێشووی گوڵ. |
| عنقود مجري | Galactic-cluster | هێشووی کاکێشان، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی جوانە بە شێوەی هێشوو لە ڕێگەی کاکێشاندا . |
| عنقودية | Staphylea | ستافیلیا، دارە هێشوو، دەوەنێکە گوڵەکەی بە شێوەی هێشووە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت ، جۆرێکی هەیە ڕۆنێکی خۆش لە تۆوەکەی دەردەهێنرێت . |
| عنقودية فطرية | Botrytis | کەڕووی هێشوویی، جۆرە کەڕوویەکی مشەخۆرە لە ڕووەك دەدات . |
| عنقودية رمادية | | بڕوانە ( عفن رمادی). |
| عنقية، زهرة العنق | Throat wort, Trachelium | گوڵەملدار، گیایەکە پەڕەکەی درێژە لە مل دەچێت . |
| عنقر | Reed ( green) | تەرکە، قامیشی سەوز. |
| عنقرة | Hawk (Female) | واشەی مێ. |
| عنقريط | Peper-nautilus, Argonauta | لەپکە کاغەز، سەدەفی کاغەز، گیاندارێکە لە هەشت پێ (ئەختەبووت) دەچێت لەپکەیەکی تەنکی هەیە. |
| عنقص | Empusa | جۆرێکە لە کوللەی بالبالوکە، واتە ئەسپی پێغەمبەر . |
| عنقش، بائع متجول | Bagman, Pedder | کۆڵگێڕ، چەرچی. |
| عنقفة | Pit of lip | چاڵی لچ. |

| | | |
|---|---|---|
| عنق الثيل | Fingered-panic grass | كزن، گیایەكە لە كۆمەڵەی دەغڵودان بۆ لەوەڕ باشە. |
| عنكبوت، عنكب، فدس، شبث | Spider | كارتینگەر، جاڵجاڵۆكە، تەڤن پیرك، مێشەگیرە، چنگی، پلۆ، پیرك، داپیرۆشكە. |
| عنكبوت احمر،بقّ الحمضيات الدقيقي | Planococcus citri, Citrus-mealy bug | قالۆنچەی ( مێش گەزۆ) مرزەمەنی، جۆرە جاڵجاڵۆكەیەكە زیان بە ڕووەكی مرزەمەنی لۆكە دەگەیەنێت. |
| عنكبوت احمر، خاشية، قمل خملي | Red Spider, Red mite, Spider mite, Trombidium | گەنەی سوور، جۆرە گەنەیەكی سووری تووكنە زیان بە گیاندار و ڕووەك دەگەیەنێت. |
| عنكبوت اصفر، ذوطة | Yellow spider | جاڵجاڵۆكەی زەرد. |
| عنكبوت الماء | Water- spider | ئاوڕۆشنكەرەوە، جاڵجاڵۆكەی ئاوی . |
| عنكبوت البحر | Sea- spider | جاڵجاڵۆكەی زەریا. |
| عنكبوت سام | Latrodectus | جاڵجاڵۆكەی ژەهراوی . |
| عنكبوت الحصاد | Harvestmite, Opiliones, Harvestmen | جاڵجاڵۆكەی دروێنە، مۆرانەی دروێنە، مۆرانەیەكی بچووكە لە كاتی دروێنەدا پەیدا دەبێت و تووشی جوتیار دەبێت و خورو لە لەشیدا پەیدا دەكات. |
| عنكبوت ذئبي | Lycosids, Lycosa, Wolf spider, Ground spider | جاڵجاڵۆكە گورگە، جاڵجاڵۆكەیەكی دڕندەیە. |
| عنكبوتيات | Arachnida, Arandia | گیاندارە جاڵجاڵۆكەییەكان، جاڵجاڵۆكە و دووپشك و گەنە و كێچ دەگرێتەوە، چوار جووت پەلیان هەیە. |
| عنكبوتية | Tradescantia, spider wort | جاڵجاڵۆكەیی، گیایەكی خشۆكە لاسكەكەی كالاندارە، ڕەنگی لاسك و هەندێك لە گەڵاكانی ئەرخەوانی مەیلەو قاوەییە، هەندێك لە گەڵاكانی سەوزە، گوڵەكەی شین یان بنەوشەییە لە ئینجانەدا دەڕوێنرێت بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە. |
| عنكبوت شبيه النمل | Ant-like spider | جاڵجاڵۆكەی مێروولەیی. |
| عنكبوت الموز | Banana spider | جاڵجاڵۆكەی مۆز، مۆز دەخوات. |
| عنكبوت الطير | Bird spider | جاڵجاڵۆكەی باڵندە، جۆرێكە لە جاڵجاڵۆكە باڵندە دەخوات. |
| عنكبوت الباب، المسحور، عنكبوت باب الفخ | Trap door spider | جاڵجاڵۆكەی تەپكە، جۆرێكە لە جاڵجاڵۆكە تەپكەیەك دروست دەكات و دەرگاكەی دەكرێتەوە و دادەخرێت بۆ ڕاوكردنی باڵندە و شەمشەمەكوێرە. |
| عنكبوت صائد السمك | Fishing Spider | جاڵجاڵۆكەی ڕاوكەر، جۆرێكە لە جاڵجاڵۆكە لە ژێر ئاودا نێچیرەكەی ڕاودەكات . |
| عنكبوت النسيج الدائري، عنكبوت النسيج الكروي | Orb-webSpider, Garden spider | جاڵجاڵۆكەی تەون بازنەیی، جاڵجاڵۆكەی كێڵگە، جۆرێكە لە جاڵجاڵۆكە تەونەكەی ( تەنافەكەی) بازنەییە، تیرەكەی نزیكەی دوومەتر و نیو دەبێت و باڵندەی پێدەگرێت. |
| عنكبوت ارضي | | بڕوانە ( عنكبوت ذئبي) . |
| عنكبوت قفاز | Jumping spider | جاڵجاڵۆكەی بازدەر، جۆرێكە لە جاڵجاڵۆكە كە توانای ئەوەی هەیە كە بە لاتەنیشتدا ڕابكات یان باز بدات. |
| عنكبوت ذو رنسيج قمعي | Funnel-wed-spider | جاڵجاڵۆكەی تەون ڕەحەتی، جۆرێكە لە جاڵجاڵۆكە تەونەكەی لە شێوەی ڕەحەتیدا دەچنێت. |
| عنم ، محلاق، حوالق | Tendril | تەرز، وەكو تەرزی دارمێو. |
| عنم، حضال، بنتومة، شيقر،خرقطان | Loranthus | ڕووەكێكی مشەخۆرە لە دەموكانە دەچێت و شاوی قەد و لقی ڕووەك هەڵدەمژێت، قەدەكەی خشۆكە و بەرەكەی لە ترێ دەچێت، ئاوگەكەی لینجە، گوڵەكەی سوورە. |

| | | |
|---|---|---|
| عنمة، عنم | | ڕووەکێکە بەرەکەی سوورە لەسەری پەنجەی بۆیەکراو دەچێت . |
| عنمي | Pampini form | ئەرزشێوە، شتێك لە شێوەی تەرزدا بێت . |
| عنميات، دبقيات | Loran thaceae | دەموکانەییەکان، کۆمەڵە ڕووەکێکی دوولەتکەیی مشەخۆرە، دەموکانە و هەندێك ڕووەکی تر دەگرێتەوە . |
| عنهة | Common-bladernut Anthonynut | دەوەنێکە گەڵاکەی ناوێتەیە ، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی سپییە، ڕۆنێکی ناخۆش لە بەرەکەی دەردەهێنرێت . |
| عنوان | Address | ناونیشان. |
| عنوان الكتاب | Title | ناونیشانی کتێب. |
| عنوان المقالة | Title, Heading, | سەروتار. |
| عنيد | Tenacious, Obistinate | ورکن، مانگر، سەرکێش، سەرچڵ، لاسار، کەللەشەق، کەللەرەق، قیرسچمە، بێگوێ، نەگریس، سەرسەخت، خرس. |
| عنيف | Severe, Violent | بەزەبر، توندوتیژ. |
| عنين، عاجز جنسياً | Impotent, Spado | ئەو کەسەی کە پیری ناکرێت ، ئەو کەسەی کە چووکی هەڵناستێت، بێکارە، شلەپەتە، بەستراو، پشت شل. |
| عنبية | Parthenocissus, Cocculus | ترێوکە، دەوەنێکی کەپرییە گەڵاکەی سێ یان پێنج پەلکی هەیە، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی شیلەدارە، ڕەنگەکەی سپی مەیلە و سوورە. |
| عنيبة | Uvula | بۆڵەترێ. |
| عنيبة هندية، سمّ السمك | Indian berry, Cocculus, Indicus plant | ژەهرەماسی، ڕووەکێکە بەرەکەی بە شێوەی هێشووی سەوزە، تانە بۆ کوشتنی ماسی بەکاردێت. |
| عنيق، زنيد | Rachilla | لاسکۆکە. |
| عهد، حين | Period, Epoch, Era, Time | سەردەم، ڕۆژگار، چاخ. |
| عهد الحجر القديم | Palaeolithic-period | سەردەمی بەردینی کۆن. |
| عهد الحجر الحديث | Neolithic-period | سەردەمی بەردینی نوێ ( تازە). |
| عهر، بيع العرض، عهارة، زنى، فسق | Prostitution, Fornication, Adultery | گاندان، جووتگرتن بە حەرامی، لەشفرۆشی. |
| عهن، صوف | Wool | خوری، پەڕن، پەشم، پەزم، کوڵك. |
| عهد الحضانة | Nursing period | سەردەمی دایەنگەیی، سەردەمی شیرخۆری. |
| عهد الحداثة | Youthfulness-period | سەردەمی منداڵی. |
| عهد الصبا | Boyhood ( youth)-period | سەردەمی لاوێتی، سەردەمی دەستەی. |
| عهد المراهقة | Adolescence, Hobbledhoyism | سەردەمی هەرزەکاری. |
| عهنة خملية، عرف الديك | Wool flower | گوڵەقەیفە، پۆپنەی کەڵەشێر، گیایەکە گەڵاکەی گەورە و گوڵەکەی ئەرخەوانییە لە پۆپنەی کەڵەشێر دەچێت بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە دەرۆێنرێت . |
| عوالق ( هوائم) | Planktons | زیندەوەرە گیراساوەکان، ئەو زیندەوەرە وردانەی کەسەر ئاو دەکەون ( دەگیرسێنەوە). |
| عوالق نباتية | Phytoplanktons | ڕووەکە گیرساوەکان. |
| عوالق حيوانية | Zooplanktons | گیانەوەرە گیرساوەکان. |
| عوائد، ضرائب | Taxes, Dues, By product | بەرهەمی لابەلا، باج. |

| | | |
|---|---|---|
| عوامل أولية | Prime factors | هۆكارە سەرەتاييەكان، هۆكارە سەرەكييەكان. |
| عوائد | Returns | دەستكەوت. |
| عوائد الأملاك، ضريبة العقار | Property taxes | باجي زەوىوزار. |
| عوائد جمركية، مكس | Customs, Custom-due | باجي گومرگ. |
| عواهن | Dry palm-branches | لقي وشكەوەبووى دارخورما. |
| عواء، نباح | Yelping, Howling | وەرين، لووراندن ، لوورە. |
| عَواء، راعي الشاة | Bootes | شوان، كۆمەڵە ئەستێرەيەكە. |
| عواشب، عاشبات | Herbivores | گياخۆرەكان، ئەو گياندارانەى كە تەنيا گژوگيا دەخۆن. |
| عَوامة | Buoy | تەنێكى كانزاييە لەسەر ئاو دادەنرێت و رێگا پيشانى كەشتييەوانەكان دەدات. |
| عَوامة | Float | سەرئاوكەوتوو، پارچە دارێكە دەخرێتە سەرئاو بۆ پێوانى خێرايى ئاوەكە. |
| عَوامة | Floater | سەرئاوكەوتوو. |
| عَوامة | Water beetle | قالۆنچەى ئاويى، مێروويەكى ( قالۆنچەيەكى) ئاويى درندەيە. |
| عوازر تناسلية، قنوات تناسلية | Genital-duets | بۆريى زاوزێ، رێبازى زاوزێ لە گياندار‌دا. |
| عوامة السمكة، نفاخة السمكة،مثانة هوائية | Air bladder, Swimming-bladder | تورەكەى هەوا، ميزەڵدانى هەوا، تورەكەيەكە لەناو سكى ماسيدا بۆ لەنگەرگرتن و بەرزبوونەوە و نزمبوونەوە لە ئاودا بەكارى دەهێنێت. |
| عوامل جوية | Climatic-factors | هۆكارەكانى ئاووهەوا وەكو گەرمى و پاڵەپەستۆ و با وشێ و هتد. |
| عُوّار، سمامة | Swift | پەرەسێلكەكێوى. |
| عوانة، نرس، دودة رملية | Sandworm, Nerels | كرمى لم، جۆرە كرمێكە لەناو لمدا دەژى. |
| عوانة | Sminthus | سمينسە، گياندارێكى شيرەدەرى قرتێنەرە لە كۆمەڵەى گۆرهەڵكەنە (يان مشك). |
| عوبر | Young leopard | بەچكەى بەور، بەچكەى يۆز. |
| عوة، است | Anus | كۆم، دامان، پامان، قنگ. |
| عوج، إعوجاج | Crook, Bend | خوارى ، خێچى. |
| عوج العظام، إلتواء العظام | Rickets | ئيسك نەرمى، ئێسك خوارى . |
| عُود، طنبور، بربط، مزهر | Lute | عود، تەموورە، جۆرە ئامرازێكى مۆزيقەيە، سينەكەمان . |
| عود | Stick, Rod, Style | چيلكە. |
| عود أحمر، قابضة، عيفقان، زهرة القبض | Pink-thrift, Statice | گيايەكى رازاندنەوەو و پزيشكىيە، گوڵى سپى و پەمەيى و لەيلاقى و سوور و ئەرخەوانى هەيە. |
| عود الأنبياء، خشب القديسين، غياك | Lignum-vitae, Guuiacum-gumtree, Guaiocum, Guaiacum | دارپێغەمبەر، درەختێك گوڵەكەى شينە گەڵاكەى لە پەڕ دەچێت و تۆوەكەى زەرد و چەورە ، تەختەكەى نايابە، مادەيەكى رێسينى لێدەردەهێنرێت بۆ مەبەستى پزيشكى. |
| عود الأسنان، عود الخلال | Toothpicks | دارى سيواك، دارى ددان ئاژنين. |
| عَود الجمود، عودة التجمد | Regelation, Refreezing | دووبارە بەستنەوە، دووبارە ڕەقبوونەوە. |
| عود الخير، طيم، بهشية الديق، زفرين لبناني | Holly-tree, Ilex | دارە پيرۆزە، دارى دەموكانە، دار و دەوەنێكە تەختەكەى بەنرخە و تونكڵەكەى بۆ دروستكردنى دەموكانە بەكاردێت ، گەڵاكەى ورد و سپىيە. |

| | | |
|---|---|---|
| عودي الشكل | Styliform, Styloid | شێوەچیلکە، چیلکە شێوە. |
| عود العطاس، سعوط | Bastard-pellitory, Sneezewort, Achillea ptarmica | گیاپشمین، گیایەکە بۆنەکەی دەبێتە هۆی پشمین. |
| عود القرح، عاقرقرحا، تاغندست، قدم اسكندر | Pellitory of spain, Pyrethrum | بڕوانە ( عاقرقرحا)، ڕەگەڕووتە. |
| عود البرق، قندول، دار شيشعان | Spiny broom, Caly cotome | دارشیشان، دەوەنێکی دڕکاویی گەڵا وردە، گوڵەکەی زەرد و بۆنخۆشە. |
| عود الحيّة | Serpent wood | دارمار، دەوەنێکە لە کۆمەڵەی ژاڵە، لە قەد و ڕەگەکەی ئاوگێك دەردەهێنرێت، دژی ژەهری مار بەکاردەهێنرێت. |
| عود النّد، يلنجوج، عود هندي، اغلاخون، عود الطيب، النجوج، عود البخور، خشب العطر | Agallochum, Indian aloetree, Calambactree, Agalloch, Aquilaria-agallocha, ealge wood, agal-wood, Alose wood | داری عوود، ئەگالۆکەم، داری بخورد، دارهیندی، درەختێکی بچووکە لە هیندستان دەڕوێت تەختەکەی نایابە و ناوگەکەی توون و سووتێنەرە، ڕۆنێکی بۆنخۆش لە تەختەکەی دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی و چارەکردنی نەخۆشی گوڵ و بەڵەکی و بۆنیخۆش بەکاردێت و ئەگەر چیلکەکەی بسوتێنرێت ئەوا بۆنێکی خۆشی لێدێت . |
| عودة النشاط، عودة الفعالية، إنتعاش | Revival, Reanimation | بوژانەوە. |
| عودة، عود | Return | گەڕانەوە. |
| عودة المرض، نكاس | Relapse of illness | گەڕانەوەی نەخۆشی بۆ کەسێك. |
| عود الوج، عرق اكور، قصب الذريرة | Sweet flag, Sweet sedge, Myrtle sedge, Acorus | بەیاخە شیرینە، گیایەکی ئاویی بۆنخۆشە بۆ مەبەستی پزیشکی و دروستکردنی بۆنیخۆش بەکاردێت، هەروەها بۆ دەرمانی چاو و نەخۆشی سنگ بەکاردێت، گەڵاکەی درێژ و باریکە، هێڵی زەردی تیایە. |
| عود الريح، أنبرباريس، برباريس، قصب ذهبي | Barberry, Berberry, Berberis, Loosestrife | داری با، زریشك، جۆرە درەختێکە مادەی بێربێرینی لێدەردەهێنرێت کە دەرمانێکە بۆ بەهێزکردنی بۆڕی و تەوژمی خوێن . |
| عود القيء | | ڕەگی گیایەکی پزیشکییە لەناوچە گەرمەکاندا دەڕوێ، ڕەگەکەی بۆ بەهێزکردن باشە و دژی ڕشانەوەیە. |
| عود الصليب، فاوانيا | Peony, Paeonia | فاوانیا، گیایەك یان دەوەنێکە گوڵێکی گەورەی سپی یان ئەرخەوانی دەگرێت بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت ، ڕەگەکەی بۆ دەرمانی کۆڵنجی منداڵان بەکاردێت. |
| عود الثقاب، عود الشخاط، كبريتة | match | دەنکە شقارتە، دەنکە شەمچە، زەلووك. |
| عود بلوري | Crystalline style | چیلکەی بلووری، بەشێکی وڵۆڵەییە لە لەشی گیاندارە نەرمەکاندا ، یارمەتی هەرسکردن دەدات. |
| عودة الشباب، تصابي | Rejuvenescence | گەڕانەوەی گەنجێتی، تەڕپیری. |
| عودة النفض، عصا النفض | | چەڵاك، چەڵاکە، قەڵانگە. |
| عودة، عصا | Stick | چیلکە، چەوێڵ، چەواڵ. |
| عودة، تعويذة، رقية | Charm, Spell | ئەفسون، جادوو، نێرەنگ، سیحر، نووشتە، تەلیسم. |
| عَور | Blind of oneeye | کوێری، کوێربوون لەیەك چاودا . |
| عوراء | One-eyed | ژنێك کە چاوێکی کوێر بووبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| عورة | Private pants, Genitals | عەورەت، ئەندامەکانی زەگەزیی . |
| عوز، نقص | Deficincy | کەمی، نەخۆشییەکە لە گیاندار یان ڕووەکدا کە بە هۆی کەمی توخمی کیمیاییەوە دەبێت لە خۆراك یان ئالیکدا. |
| عوز الطعام | Abrosia | کەمی خۆراك، پێویست بوون بە خۆراك. |
| عوسج، شوکل، عليق، حضض، باطش، خولان | Box thorn, Prick box Lycium, African teatree, Kaffir thorn, Black berry | تووترك، تووډڕیی، دڕکی دێو، چالووك، دەوەنێکە لقەکانی دڕکاوییە بۆ پەرژین باشە، بەرێکی سووری هەیە لە تووی ورد دەچێت و دەخورێت . |
| عوسج أسود، جلهم | Alder buck thorn, Black alder | تووترکی ڕەش. |
| عوسق، صقر الجراد، عويسق | Windhover, Lesser Kestrel | هەڵۆی کولله، هەڵۆی بچووك، چەڵە کوێرە، جۆرێکە لە هەڵۆ دەنووکی شینی کاڵە، قاچی زەردە و نینۆکەکانی ڕەشە ، باڵندەیەکە بەقەدەر واشە دەبێت و سووره و پنکەی ڕەشی تیادایە، دەنگی شەقەی باڵی دێت و مشك دەخوات. |
| عوض | Substitute | لەباتی، لەبری، لە جیاتی. |
| عوطب، تبقع | Scab | گەڕیی، نەخۆشییەکی ڕووەکییە وەکو لە هەڵوژە و سێو و چنار و گوێز و گێلاسدا. |
| عوف | Penis | چووك، کێر. |
| عوف، عبقة | Devil wood | داری دێو، دار و دەوەنێکە لە کۆمەڵەی زەیتوون، گوڵەکەی سپی و بۆنخۆشە، دەکرێتە چاییەوە بۆنەکەی خۆش دەکات. |
| عوف الطعام، کره الطعام | Cibophobia | حەزنەکردن لە خواردن، نەمانی ئیشتیا. |
| عوق، إعاقة، تأخير | Delaying, Retarding | تەگەرە، کۆسپ. |
| عولق، مصاصة، نزافة | Diphyllia, Vampire | شەمشەمەکوێرەی خوێنمژ، جۆرێکە لە شەمشەمەکوێرە، ڕەنگەکەی قاوەیی مەیلەو سووره، خوێنی گیاندار دەمژێت. |
| عوم | Swimming, Floating, Floatation | سەرئاوکەوتن، مەلەکردن. |
| عومة، دعموص | Tadpole | سەرەمێکوتە، بەچکەی بۆق. |
| عومة | Water-beetle, Dytiscid | قالۆنچەی ئاویی، مێروویەکی ئاویی چاوچنۆکە، مێتولکەی مێرووە ئاوییەکانی تر دەخوات. |
| عومة، عومة دوامة، خنفساء مدومة | Whirligig-beetle | ئاوڕۆشنکەرەوە، جۆرە قالۆنچەیەکە بەسەر ڕووی ئاودا دەخولێتەوە. |
| عومج | Short snake | کوڵەمار. |
| عون، إعانة، مساعدة - معونة | Help, Assistance | یارمەتی، یاریدە، هاریکاری. |
| عومح، ظبية | Antelope | ئاسك، مامز. |
| عوهق | Black martin | پەرەسێلکەی ڕەش، تەرنە نەبابیلە. |
| عويل، نواح | Wailing, Lamenling | لوورە، لووراندن، قیژە، زرێکە، زیرە. |
| عوين، لوبياء | Cowpea | لۆبیا، گیایەکە لە کۆمەڵەی پاقلەیە، بەرەکەی لە پاقلە بچووکتر و سپییە دەکرێت بە چێشت. |
| عويسة | Small knife | قەڵەمبڕ، چەقۆیەکی بچووك. |
| عويسق | | بڕوانە (عوسق). |

| | | |
|---|---|---|
| عويص، صعب | Difficult | گران، زەحمەت، قورس، ئاڵۆز. |
| عوينة | Ommatidium | چاوۆکـە، بەشـێکە لـە بەشـەکانی چـاوی ئاوێتـە لـە گیـاندارە پـێ جومگەدارەکاندا. |
| عوينات، نظارة | Spectacles, Eyeglasses | چاویلکە، عەینەك. |
| عويلم | Sub-kingdom | ژێر شانشین، کۆمەڵێکە لە زیندەوەر. |
| عويناتي | | چاویلکە ساز. |
| عويهرة، جعفيل مصري | Orobanche-aegyptiaca | گیاکەڵـەی میسری، ڕووەکێکـی دوولەتکـەیی بـێ گەڵایـە، لەسـەر ڕەگـی ڕووەکی تر دەژی. |
| عويكشة، عويكشة الفرج، شوكة الفرج | Fourchet, Fourchette | بڕوانە (شوكه الفرج). |
| عَيّ، حبسة الكلام | Anepia, Acatapharia, Bradyphasia | زمان گیران، زمان شکان، نەتوانینی دەربڕینی مەبەست بە قسە، نەتوانینی قسەکردن. |
| عيادة، زيارة | Visiting | سەردان، دەیدەنیی، سەرلێدان. |
| عيادة خارجية | Outpatient | سەردانگەی پزیشکیی لە دەرەوەی نەخۆشخانە. |
| عيادة طبية (مكان) | Surgery, Consulting room, Clinic | کلینیك، سەردانگەی پزیشکیی، دیدەنگەی پزیشکیی، جێگەی نووستنی نەخۆش، جێگەی پشکنینی نەخۆش. |
| عيادة طبية، زيارة طبية | A visit (from-a physician) | سەردان لە پزیشك. |
| عيار | Standard-measure, Caliber, Titer, Titre | پێوان، پێوانە. |
| عيار، مثقال | Title, Titre | مسـقاڵ، سەنگ، بڕێکـی پـەتی یـان خالیسـە لـە توخمێـك لـە مادەیـەکدا، بۆنموونە ئەگەر بڵێین سەنگی سپیرتۆ دەکاتە ٨٥ واتە ئەو سپیرتۆیە لـە ٨٥٪ ئەلکهولی تیادایـە و ئەگـەر بڵێـین سـەنگی زێـڕ دەکاتـە ١٨ واتـە ئـەو خشڵە یان ئەو پارەیە ١٨ بەش لە ٢٤ بەش زێڕی خالیسەی تیادایە. |
| عيار (عيارات) | Weight | سەنگ، بۆ پێوانی شتومەك. |
| عياري، قياسي | Normal | سەنگی، پێوانەیی. |
| عيارية | Normality | سـەنگێتی، بوونـی یـەك کێشـی هـاوهێز لـە مـادەی تـواوە لـە لیـترێك لـە گیراوەیەکدا. |
| عيار ناري | Shot | گوللە، فیشەك. |
| عيار البندقية أو المدفع | Caliber, Calibre | تیرەی گوللەی تفەنگ یان بۆمبا، تیرەی ناوەوەی لوولە تۆپ یان تفەنگ. |
| عيار، رافعة | Crane | کرێن، دەزگای شت بەرزکردنەوە. |
| عياط | Crying, Shouting | قیژە، هاوار، زریکە، چریکە، زووڕە، زیڕە. |
| عياش، خباز | Bread seller | نانفرۆش، نانەوا، نانکەر. |
| عياف، فقد شهوة الطعام | Anorexia, Asitia | ونکردنی ئارەزووی خواردن، نەمانی ئیشتیایی خواردن. |
| عيان | Seeing, Viewing | بینینی تەواوی بێگومان. |
| عياني | Megascopic, Macroscopic | بەچاو، هەرشتێك تەنها بەچاو ببینرێت واتە بەبێ میکرۆسکۆپ. |
| عَيّان | ill, Sick | نەخۆش. |
| عياء، تعب | Faintness, Lassitude | ماندوویەتی، ماندووبوون. |

| | | |
|---|---|---|
| غرغم | Grogram | گرۆگرام، قوماشێکە لە ئاوریشم یان لە ئاوریشم و خوری دروست دەکرێت. |
| غرغر، دجاج حبشي، دجاج فرعوني، دجاج سندي | Guinea-fowl, Numeda | مریشکی حەبەشە، چین و ماچین، مریشکی سندی، مریشکە شامی، هەندێکی سپی و هەندێکی سوور و هەندێکی ڕەش و کونجە. باڵ و کلکی کورتە. |
| غرغور | Gerrhonotus | جیرۆنۆتەس، جۆرە مارمێلکەیەکە، هێڵی ڕەش و سپی تێدایە. |
| غرغور | | بڕوانە (غریر، زبزب). |
| غرغرة الموت، حشرجة | Death-rattle | گیانەلا. |
| غرفة، حجرة | Room, Chamber | ژوور، هۆدە، ئۆدە. |
| غرفة التبريد | Cooling chamber | ژووری سارد کردنەوە. |
| غرفة الفقاعات، حجرة الفقاعات، غرفة فقاعية | Bubble chamber | ژووری بلق، ژورێکە (قاپێکە) شلەیەکی تێدایە وەکو هایدرۆجینی شل. زۆر گەرم کراوە، کاتێك کە تەنێکی ئایۆنراوی پیادا دەڕوات، دەزوویەك لە بلق بە درێژایی ڕێڕەوەکەی پەیدا دەکات و وێنەی ئەم ڕێڕەوە تۆمار دەکرێت بۆ مەبەستی خوێندن و لێکۆڵینەوە. |
| غرفة السحاب، غرفة ولسون السحابية، غرفة سحابية | Wilson Cloud-chamber, Cloud-chamber | ژووری هەور، ژووری هەوری ویلسۆن، دەزگایەکە بۆ پێوان و ناسینەوەی ڕێڕەوی ئەو تەنۆکە وردانەی کە بە میکرۆسکۆپی ئاسایی و ئەلیکترۆنی نابینرێن. |
| غرفة الأحتراق | Combustion chamber | ژووری سووتان. |
| غرفة الأكل (الطعام) | The dining room | ژووری نانخواردن. |
| غرفة سوطية | Flagellated-chamber | ژووری قامچی، لە لەشی ئیسفەنجدا هەیە. |
| غرفة التاين | Ionization chamber | ژووری بەئایۆن کردن، ژووری بوون بە ئایۆن، ژوورێکە تیایدا گەرد یان گەردیلە توخمی تیادا دەکرێت بە ئایۆن بەکاری تەنۆکەی ئەلفا یان گەرمکردن. |
| غرفة زجاجية | Vitreous chamber | ژووری شوشەیی، بۆشاییەکە دەکەوێتە نێوانی زەرەبین و تۆرێنەی چاوەوە، مادەیەکی شووشەیی جەلاتینی تیادایە. |
| غرفة الزراعة | Chamber of agriculture | ژووری کشتوکاڵ. |
| غرفة التحكم، غرفة السيطرة | Control room | ژووری کۆنترۆل، ژوورێکە دەزگای وردی تیادایە بۆ چاودێری و کۆنترۆڵی هەندێك پرۆسەی پیشەسازییانە. |
| غرفة المطالعة | The study room | ژووری کتێب خوێندنەوە. |
| غرفة تجفيف المحاصيل | Drying rooms | ژووری ووشککردنەوەی بەرهەمی ڕووەك. |
| غرفة المؤنة | Pantry room | ژووری زەخیرە. |
| غرفة التجارة | Chamber of commerce | ژووری بازرگانی. |
| غرفة النوم | Bedroom | ژووری نوستن. |
| غرفة النوم ( في المدارس) | Dormitory | ژووری نوستن لە قوتابخانەدا. |
| غرفة هوائية | Air chamber | ژووری هەوایی. |
| غرفة العمليات | Operation room | ژووری نەشتەرکاریی، ژووری نەشتەرگەری. |
| غرفة الضيوف | Guestroom | دیوانخانە، دیوەخان، ژووری میوان. |
| غرفة الأستقبال | Drawing room | ژووری میوان، دیوەخان. |
| غرفة كاتمة للصوت | Dead room, Anechoicroom | ژووری دەنگنەگەز، دەنگ دابڕکردن. |

| | | |
|---|---|---|
| غرفين | Griffin | گریفین، گیانداریکی ئەفسانەیە نیوەی سەرەوەی دالّە و نیوەی خوارەوەی شێرە . |
| غرف | To ladle, Dip up | هەڵ کوزین، کەف گرتن. |
| غرق | Sinking, drowning | نقووم بوون ، خنکان لە ئاودا، لە ئاودا خنکان، فەتسان، نوگم، نوقم . |
| غرقد | | بڕوانە ( غردق، غرغد). |
| غرقد | White of egg | سپێنەی هێلکە، سپێنەی چاو، بەزی چاو. |
| غرقد، فراج | Nitre bush, Salt tree | دار و دەوەنێکی دەشتەکی دڕکاوییە، گوڵەکەی سپییە، بەرەکەی لە ترێ دەچێت نووکێکی تیژی هەیە ڕەنگەکەی سوور یان ڕەشە. |
| غرقد | Lycium afrum | دڕکەزیی، تووترک. |
| غرلي | | بڕوانە ( غوریلا). |
| غُرلة، ارلة، قلفة | Foreskin, Prepuce | پێستی چووکی منالْ کە لە کاتی خەتەنەدا دەبڕدرێت . |
| غُرم، خسارة | Loss | وونکردن. |
| غرم، خناق الخيل | Strangles | وەناقی ولاخ، نەخۆشییەکی درمەو لە کۆئەندامی هەناسەدانی ولاخ دەدات |
| غرمول، قضيب | Penis, Phallus | چووك، کێر، حەیتە. |
| غرن | Crow ( male) | نێرەی قەلەڕەشکە. |
| ُرنة، قرحة تناسلية | Chancre | برینێکی ئاتەشەکی ( سفلس) ڕەقە . |
| ُرن، سرقومة | Sarcoma | سارکۆما، وەرەمێکی پیسە. |
| غرن كيسي | Cysto sarcoma | وەرەمی تورەکەیی. |
| غرن عظمي | Osteoma, Osteosar coma | وەرەمی ئێسکی. |
| غُرنوق، غرناق، كركي | Balearica, Crane | کەڵەك، قوڵنگ، باڵندەیەکی ئاویی گەورەیە، باڵی پانە و لاقی درێژە، ڕەش یان قاوەییە، پۆپنەیەکی زەرد بەسەرییەوەیە. |
| غرنوق، متوج، كركي متوج، رهو، غرنيق | Crowned-crane | کەڵگی کڵاودار، قوڵنگی کڵاودار، باڵندەیەکی گەورەی کلك کورتی مل و لاق درێژە. |
| غرناد | Grenadier | گرینادیر، ماسییەکی دەریاییە. |
| غرنوقية، نحامية | Flaming oplant | گیاکەڵگ، گیا قوڵنگ، گیایەکە گوڵی سووری جوان دەگرێت . |
| غرنوقي، غرنوق، إبرة الراعي، جيرانيوم | | شەمەدانی، دەرزیی لۆکە، دەنووکی لەق لەق، ڕووەکێکە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردەهێنرێت ، جۆرە گیایەکە گوڵی جوانی هەمەڕەنگ دەگرێت. |
| غرنار، طريخلا | Gurnard | گەرنارد، ماسییەکی سەر دڕکاوییە. |
| غرنار طائر | Flying gurnard | گەرناردی فڕندە، جۆرە ماسییەکە پەڕەکانی لە باڵ دەچن و یارمەتی دەدەن بۆ دەرپەڕین بۆ ماوەیەکی کەم لەسەر ڕووی ئاوەکە. |
| غروي ( كالغراء)، غرواني | Glutionous, Colloidal, Gluey | مڵ، ماددەیەکە نە دەتوێتەوە نە دەبێت بە کریستاڵ. |
| غروية، قلومية | Collomia | کۆلۆمیا، ڕووەکێکە تۆوەکەی لینجە. |
| غروي، غرواني | Viscous, Sticky | مڵ، لیقاو، شرێش، لینجاوی، مڵت، ملتە، لینجاو، لیق، وەکو شیر و خوێن و زەمقی شل. |
| غروي ليوفوبي | Lyophobic-colloid | گیراوەی لیۆفۆبی، گیراوەی مڵی ئاوەندی بڵاوبوونەوە نەویست، وەکو گیراوەی مڵی کانزاکان ( میتاڵەکان) لە ئاودا. |
| غروي ليوفيلي | Lyophilic-colloid | گیراوەی لیۆفیلی، گیراوەی ئاوەندی بڵاوبوونەوە ویست، وەکو گیراوەی مڵی جەلاتین یان پرۆتین لە ئاودا. |

| | | |
|---|---|---|
| غرور | Conceit, Vanity | بایی بوون، لەخۆبایبوون. |
| غروب، افول | Decline, Setting | ئاوارەبوون. |
| غروت | Groat | گرۆت، پارەیەکی بەریتانی کۆنە دەکاتە چوار پەنس. |
| غروب الشمس | Sunset | ئاوابوونی خۆر، خۆرئاوا، ئاوابوونی ڕۆژ. |
| غرویر | Gruyere | گرییار، جۆرە پەنیرێکی زەردی کونکونە. |
| غروسولاریت | Grossularite, Gooseberry-stone | گرۆسۆلاریت، کەرەسەیەکی خاوە، بریتی‌یە لە گارنیتی سەوز، بریتی‌یە لە سلیکاتی ئەلەمنیۆم و کالیسۆم لە بەردی قسلی پیسدا هەیە، ڕەنگەکەی لە ڕەنگی ( گووزبێری) دەچێت . |
| غَرية | Garrya | گاریا، دەوەنێکە گوڵی سەوز یان زەرد دەگرێت . |
| غریب، اجنبي | Foreigner, Stranger, Exotic | بێگانە، دەرەکی، ئاناشنا، بیانی، ئاوەکی. |
| غریب الأطوار | Eccentric | کەسێك ڕەفتارەکەی ئاناسایی بێت. |
| غریب، عجیب | Strange, Wonder ful, Xenon, Alien | سەیر، ئاناشنا. |
| غریب | Ixora, Wild jasmine | یاسەمەنە کێویلە، دارودەوەنێکی دەشتەکی و کشتوکاڵی‌یە، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی بچووکی بۆنخۆشە، سپی یان سوورە. |
| غريبة، زهرة غريبة | Aethionema | گوڵە سەیر، گیایەکە ئەندامی نێرەکی‌یەکەی شێوەیەکی سەیری هەیە. |
| غريزة | Instinct, Natural-impulse | ڕەمەك، غەریزە، خەیم، بیم، سەلیقە، پاڵنەرێکی بنچینەیی‌یە بەکار خۆی دەردەبرێت، وەکو ڕەمەکی مان ( البقاء) و ڕەمەکی دایکایەتی (الامومة) . |
| غريزة جنسية | Sexual instinct | ڕەمەکی ڕەگەزیی. |
| غريزة الأمومة | Maternal-instinct | ڕەمەکی دایکی. |
| غرين، طمي، إبليز | Alluvium, Silt | لیتە، قوڕاو، قوڕولیتە، لیتاو. |
| غريال، تمساح هندي | Gharial, Gavial | گریال، تیمساحێکی گەورەی هیندی‌یە. |
| غرياق، سقاوة صقرية | Rough-Legged, Buzzard | جۆرە هەڵۆیەکی گەورەیە، ڕەنگەکەی قاوەیی مەیلە و سوورە مار و مێروو دەخوات. |
| غريفة | Loculus, Locule | ژوورچکە، وەکو ئەو بۆشایی‌یەی لە هێلکەدانی ڕووەکدا هەیە. |
| غرياق، قاق | | بڕوانە ( غراب الماء، غراب البحر). |
| غريسة، شجرة مظلية | Umbrella tree | درەختی چەتری، درەختێك شێوەکەی وەکو چەتر وابێ. |
| غريض، طلع | Pollen | هەڵاڵە، هەڵاڵەی گوڵ. |
| غريد، مغرد | Songster, Worbler | خۆشئاواز، باڵندەی خۆشئاواز. |
| غريف، خيزران | Bamboo | ڕووەکی حەیزەران. |
| غريق، غارق، غرقان | Drowned | خنکاو لە ئاودا. |
| غريف | Griffon | گریفین، سەگێکی بچووکی بەلجیکیە. |
| غريفيلية، غرويلا | Grevillea, Silky oak | گریڤیلیا، دار و دەوەنێکی ڕازاندنەوەیە، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی‌یە، ڕەنگەکەی زەرد یان سوور یان پرتەقاڵی یان سپی‌یە. |
| غُرير، زبزب، غرغور | Badger | چاڵەکە، چواڵوو، گیاندارێکە لە سەگ و پشیلە دەچێت، گۆشتخۆرە، کلکی کورتە، پەلی کورت و ڕەشە، شێوەی لە شێوەی ورچ و دەڵەك دەچێت، لەڕوی لاکێشەیی‌یە دوو هێڵی سپی لەلاتەنیشتی لەشیدا هەیە، لەژێر زەویدا قوموش ڵێدەدات . |

| | | |
|---|---|---|
| غرير العسل، زبزب العسل | Honey badger, Ratel | چوالـوی هـەنگوین، راتێـل، چاڵەگـەی هـەنگوین، گیـاندارێکی ئـەفریقی بەمێزە، ئاڵودەی هەنگوینە، بەشوێن شانەکانیدا دەگەڕێت. |
| غرينوكيت | Greenockite | گرینوکیـت، کەرەسـەیەکی خـاوە، بریتییـە لـە گۆگردیـدی کـادمیۆم، ڕەنگەکەی زەردی مەیلە و پرتەقاڵی ڕۆشنە، لە کەرەسە خاوەکانی تۆتیادا لە سکۆتلەندە هەیە. |
| غرينادين | Grenadine | گرینادین.<br>١. جۆرە قوماشێکی تەنکە.<br>٢. ڕەبەنار، کە لە دروستکردنی مەیدا بەکاردێت . |
| غزّال، غازل | Spinner | ڕێسەر، تەشی ڕێس. |
| غزال، ظبي | Gazelle, Gazella | ئاسك، مامز، شەمکور، بانیز، ئاهو، جەیران، غەزاڵ، گیاندارێکی شیردەری سمدارە. |
| غزال إيزابيلا | Isabella-gazella | ئاسکی ئیزابێلا، ئاسکێکی خۆڵەمێشییە، سمتی سپییە. |
| غزالة، انثى الغزال | She- gazella, Doe spinner | ئاسکی مێ. |
| غزال ريل | Addra- gazella | ئاسکی مل سوورە. |
| غزال العرب، غزال اعفر، عيل | Arabica- gazella, Antilope- arabica | ئاسکی عەرەبی، ئاسکێکی مل کورتە. |
| غزال مرقط، جيتال | Chital, Spotted-deer | ئاسکی بەڵەك. |
| غزال هندي، شنكارة | Beneti gazella | ئاسکی هیندی. |
| غزال المسك، آيل المسك | Musk deer | ئاسکی مسك، جۆرە ئاسکێکە بۆنێکی خۆش لەناوسکی دەردەهێنرێت. |
| غزال الرنة | Rein deer | ئاسکی ڕین، جۆرە ئاسکێکی ماڵییە لە ناوچەی پۆڵی باکووری دەژی، گالیسکەی پێ ڕادەکێشن. |
| غزال جرانت | Granti- gazella | ئاسکی گرانتی. |
| غزال أحمر، يمور | Roe deer, red deer, Stag | ئاسکە سوورە. |
| غزال الصحراء، غزال الجزائر | Dorcas gazella | ئاسکی جەزائیر، جۆرە ئاسکێکە شاخەکەی بۆشە، پشتی مەیلە و سوورە و سکی سپییە، لە بیابانی ئەفریقادا دەژی. |
| غزال المغزى | Zeran, Goat- gazella | ئاسکە بزنە، جۆرە ئاسکێکە لە بزن دەچێت لە ناوەڕاستی ئاسیادا دەژی. |
| غزال قوفز | Spring bok, Spring buck | ئاسکی بازدەر، ئاسکێکە بازی سوکەڵەی جوان دەدات چ لە خۆشیدا بێ یان لە ترسدا . |
| غزال إمبالا | Impalla | ئاسکی ئیمپالا. |
| غزال ذكر | Gazella ( male) | ئاسکی نێر. |
| غزال والر، غزال غرنوق، عوهج، جرينوك | Gerenuk | جرینۆك، ئاسکێکی مل درێژە. |
| غزال التبت، جوا، غوا | Tibetan gazella, Goa | گوا، ئاسکی تیبەت. |
| غزال منوط | Goitred-gazella | جەیران، ئاسکێکە لە ئێران و تورکیادا هەیە. |
| غزال حميرة، أم جابة | Rufifrohsga, Korln (or) Red fronted gazella | ئاسکی ناوچەوان سوور. |
| غزال رئم | | ئاسکی لۆدەر. |
| غزال يعفور | Leptoceros gazella | ئاسکێکی سپییە لە میسر هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| غزال أبو الحراب | Leptoceros-abuharab | ڕەنگەکەی خاکی لە بیابانی لیبیا و جەزایر هەیە، ئاسکی سونگیدار. |
| غزال ريم | White gazella | ئاسکە سپی. |
| غزال أريل، غزال أردع | Dama gazella | ئاسکی داما. |
| غزال سومرنج، | Soemmeringi-gazella | ئاسکی سومەرنجی. |
| غزال عول | | |
| غزال ميرة، هبيج | Tilonura gazella, Heuglin | ئاسکی هیوگلین، ڕەنگەکەی خاکی‌یەکی تۆخە. |
| غزال أدم، أدم | Atlas-gazella, The Edmi, Cuvieri gazella | ئاسکی ئەدیم. |
| غزال نبّاح، وعل الغابة | Bush buck, Bush bock | فیلەگێژە، فیلگێجە، گور، گیاندارێکە لە ڕەنگ وشێوەدا وەکو ئاسکە بەلام لە ئاسك گەورەترە و وەکو سەگ ئەوەڕێ، گۆشتی دەخورێت . |
| غزالة | | ئامرازێکە بۆ پارچە پارچەکردنی کانزاکان . |
| غزالة | Spinster | ژنێك ئیشەکەی دڵداریی بێت، قەدرە کچ. |
| غزالة، نعمية، نعامية، ورك الدب | Euphorbia-cornuta | جۆرێکە لە ڕووەکی شیرمار. |
| غزّار، قصب الرمل | See sand, Reed | تەرکە، جۆرە قامیشێکی باریکە، پێنووس (قەڵەم)ی لێدروست دەکرێت هەروا دەکرێت بە چیغ و پەرژین بۆ باخ. |
| غزان | Gazania | گازانیا، جۆرە گیایەکە گوڵی گەورەی زەرد دەگرێت . |
| غزارة، كثرة | Abundance | خوڕم، لێزمەیی، خوڕمەیی، زۆریی، فرەیی. |
| غزارة البول | Diuresis | فرەیی میز، زۆری میز. |
| غزارة الطمث | Menorrhagia | حەیزی بەتین. |
| غزارة العرق | Polyhidrosis, Suporesis | ئارەق زۆریی، زۆریی ئارەق. |
| غزل | Flirtation | دڵبازی، خۆ خۆشەویست کردن لە لای ئافرەت ، دڵداری‌کردن. |
| غزل، فتل، برم | Spinning | ڕێستن، ڕەستن، رستن. |
| غزل، خيط مغزول | Yarn | بەن، ڕێسراو، ریس، تاڵ. |
| غزل البنات (حلوى) | Shredded ( Orcotton)-candy | حەلْوای پەشمەك. |
| غزل فطري، مايسيليوم | Mycelium | ریسی قارچك، تۆزێکە لە دەزوولەی باریك لە لەشی قارچکدا. |
| غزل السعالي، حجر الفتيل | Asbestos, Amianthus | ئەسبێست، بەردەپلیتە، بریتی‌یە لە سلیکاتی کالیسیۆم و مەگنیسیۆم بە شێوەی ڕیشاڵی باریکی نەرم کە ناسوتێت. |
| غزنايج، شمار، رازيانج | Foeniculum fennel | ڕازیانە ( بروانە شمار) . |
| غزو، إغارة | Invading, Raiding | داگیرکردن، هێرش بردنەسەر، پەلاماردان. |
| غزوة، غارة | Invasion, Attack | هێرش، پەلامار. |
| غزيّ ( قماش) | Gauze | شاش، برنجۆك، جۆرە چنراوێکی شاشی تەنکە. |
| غزير | Abundant | فرە، زۆر، لێزمە، گەلەك. |
| غزيرة، حلوبة | Dairy cow | هەر مانگایەك شیری زۆر بێت. |
| غزيزنة، سُعد | Dwarf galingale, Dwarf cyperus | خرنوك، گیایەکی دڕکاوی‌یە بەسەر زەویدا دەخشێت، بەرەکەی لە زەیتون دەچێت و تفت و تاڵە . |
| غزيزية، كزبرة البئر | Salvinia | گژنیژی بیر، ڕووەکێکە لەناو زەلکاودا دەژی. |

| | | |
|---|---|---|
| غزيل، إبرة العجوز | Pick needle, Pingrass | گیادەرزی، دەرزی پیرێژن، گیایەکی دەشتەکی‌یە لە کۆمەڵەی دەرزیلۆکەیە، گوڵەکەی سووری مەیلە و بنەوشەیییە، بەرەکەی لە دەنووکی باڵندە دەچێت . |
| غسالة | Laundress, Washer-woman | ژنی جل شۆر. |
| غسال | Washer-man | پیاوی جل شۆر. |
| غسالة كهربائية | Washing machine | جل شۆری کارەبایی. |
| غُسالة، مياه المجارير | Sewage water | ئاوی زێراب، ئاوی پیس. |
| غساق | Pus, Matter | کێم و زووخاو. |
| غسق | Dusk, Twilight | سەرەتای شەو، ئێوارەوەختە. |
| غسقي | Crepuscular | ئێوارە وەختەیی. |
| غسقية، ليلية | Whit-linedart moth, Heart and dart moth | جۆرە پەپولەیەکە ( مۆرانەیەکە) زیان بە رووەك دەگەیەنێت وەکو رووەکی گەنم و پاقلەمەنی و کەلەرم و گەنمەشامی . |
| غسل | Washing, Lavage, Lavation | شتن، شۆرشین، شۆردن، داشتن. |
| غُسل، وضوء | Ablution | ووسڵ، دەست نوێژشتن، دەست نوێژگرتن. |
| غسل ( في الكيمياء) | Scrubbing | شتنەوە، وەکو شتنەوەی تێکەڵێکی گازی بە شلەیەکی تایبەتی. |
| غسل الدم | Hematoca-tharsis | خوێن شتن، شتنی خوێن. |
| غسل المعدة | Gastric lavage | شتنی گەدە. |
| غسلس الأمعاء | Intestinal-lavage | شتنی ریخۆڵە. |
| غسل القوائم | Pedilure, Pediluvium | لاق شتن، قاچ شتن، شتنی قاچی گیاندار بە تایبەتی ئاژەڵ، بۆ قەدەغەکردنی نەخۆشی تەبەق. |
| غسول | Detergent | شۆرەر، هەرشتێك بۆ شتن بەکاربێت وەکو تاید و سایت. |
| غسول ( دواء) | Lotion, Wash | دەرمانی شۆرەر، دەرمانی برین شتن، شۆرەر. |
| غسول، خطمي مخزني | Sweet weed, Marshmallow | گوڵەمێرۆ، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| غسول قلوي | Lye | گیراوەی قلیە، بۆ شتن و دروستکردنی سابوون بەکاردێت. |
| غسول العين | Eye wash | دەرمانی چاوشتن (بۆریك). |
| غسول نحاسي، سائل نحاسي | Cupric wash | شۆرەری مسی، دەرمانێکە بۆ کوشتنی مێروو و چارەکردنی نەخۆشی رووەکی. |
| غسول، اشنان ابو ساق | | بروانە (غاسول). |
| غسول الضأن | Sheep-dip | دەرمانی مەڕومالآت، شلەیەکی کیمیاییە، مەڕومالآتی تیادا نوقم دەکرێت بۆ کوشتنی مێرووی مشەخۆر. |
| غسيل، مغسول | Washed | شۆراو. |
| غسوة، كلاديشيا | Gleditschia, Thorned acacia | گلادیشیا، درەختێکی رازندنەوەی درکاوییە، گەڵاکەی ئاوێتەیە لە پەر دەچێت، بەرەکەی لە خرنوك دەچێت. |
| غش، زغل، خداع | falsification, Fraud | گزی، تەڵەکەبازی، فێڵ، ساختە، دەغەڵ، خەوش. |
| غش البزور | Adulteration of seeds | گزیکردن لە دەغڵوداندا، وەکو تێکەڵکردنی تۆوی چاك و خراپ. |
| غشّ (في المواد) | Adulterate | گزیکردن لە شتومەکی وەکو خۆراك بە تێکردنی مادەی ئاناسایی یان هەرزانتر. |
| غشاش، مخادع | Deceit, Cheat, Deception | گزیکەر، تەڵەکەباز، فێڵباز، ساختەچی، ناپاك. |

| | | |
|---|---|---|
| غشاء | Membrane, Tegument | پەردە، پەردەی تەنك، دەولێبان، توێ، توێك، بە تایبەتی پەردەیەكی ئەندامی. |
| غشاء مخاطي | Mucosa, Mucous-membrane | پەردەی چڵمین، پەردەی لینج. |
| غشاء المساريق | Mesenteric membrane | پەردەی ریخۆڵە. |
| غشاء الجنب، غشاء الرئة، غشاء البلورا | Pleura | پەردەی سی، پەردەی لاتەنیشت، ئەو پەردەیەیە كە دەوروپشتی سی‌یەكانی داوەو بووە بە بەرێك بۆ قەفەزەی سنگ. |
| غشاء نخاعي | Perimyelis | پەردەی مەغزی. |
| غشاء غربالي | Sievemem | پەردەی بێژنگی. |
| غشاء نووي | Nuclear membrane, Karyotheca | پەردەی ناووكی، پەردەی دەوروپشتی ناوكی خانە. |
| غشاء مفصلي | Articular- membrane | پەردەی جومگەیی، پەردەیەكی نەرمە كەوتۆتە نێوان پارچەكانی لەشی گیاندارە جومگەدارەكانەوە. |
| غشاء دهني | Adiposa membrane | پەردەی چەوریی، چینی چەوریی ژێر پێست. |
| غشاء ساقط، نفاض | Caduca membrane | پەردەی داكەوتوو، پەردەی هێلكە، ئەو پەردەیەی لە گەڵ وێڵداشدا دێتە دەرەوە دوای منداڵبوون. |
| غشاء رهل، غشاء شربنل | Flaccida- membrane, | پەردەی شۆڕ، پەردەی شراپنێل، بەشێكە لە پەردەی گوێ. |
| غشاء يعقوب | Jacobi membrane, | پەردەی جاكۆب، پەردەی یاقوب، چینی دەرەوەی تۆڕینەی چاو. |
| غشاء الأمنيون، صاءة | Amnion, Pellucida membrane | پەردەی ئەمنیۆن، پەردەی ناوەوە لەو پەردانەی كە كۆرپەلەیان تێدایە لە سكی دایكیدا. |
| غشاء ملون للقزحية | Pigmentata membrane | پەردەی ڕەنگین لە پەلەزەی (ڕەشێنەی) چاودا. |
| غشاء كورتي | Tectoria membrane, Membrane of corti | پەردەی كۆرتی، پەردەیەكە لە ناوەوەی گوێچكەدا. |
| غشاء صوتي | Vocalis membrane | پەردەی دەنگی، ئەو پەردە لینجەی وا بە ژێی دەنگەوە. |
| غشاء حيواني، رقّ | Animal membrane | پەردەی گیانداری، پەردەیەكە لە بنچینەدا لە لەشی گیاندارەوە بێت. |
| غشاء ارنولد | Membrane of arnold | چینی ڕەنگین لە پەلەزەی (ڕەشێنەی) چاودا. |
| غشاء بروش | Membrane of brush | پەردەی برۆش، پەردەی چینی ناوەڕاست لە چینەكانی گلێنەی چاو. |
| غشاء قاعدي | Basement membrane | پەردەی بنكەیی، پەردەیەكە لە نێوان چینەكانی پێستدا. |
| غشاء عضلي | Sarcolemma, Myolemme | پەردەی ماسولكەیی. |
| غشاء نصف ناضح | Semipermeable membrane | پەردەی نیوەدادەر، پەردەی نیوەدەڵێنەر. |
| غشاء ناضح، غشاء نفاذ | Permeable membrane | پەردەی دەڵێنەر، توێكی دادەر. |
| غشاء ساقط | Decidua | پەردەی داكەوتوو، پەردەی ناوەوەی منداڵدان كە لە كاتی منداڵبوون دا دەكەوێت . |
| غشاء المح، غشاء صفاري | Vitelline (yolk) membrane | پەردەی زەردێنە، پەردەی زەردێنەی هێلكە. |
| غشاء السقف | Tectorial- membrane | ئەو پەردەیەیە كە بانی ( سەربانی) كۆرتی لە ئێسكە پێچاوپێچەكەی ناوگوێ دادەپۆشێت . |

| | | |
|---|---|---|
| غشاء البيضة، غرقيء | Egg-membrane | پەردەی ناوەوەی هێلکە. |
| غشاء الحافر | Periople | پەردەی سم، پەردە تەنکەکەی دیوی سمی وڵاخ. |
| غشاء الفطر | Volva | پەردەی قارچك، ئەو پەردە تەنكەی كە لەشی قارچكی داپۆشیوە. |
| غشاء رامش، الجفن الثالث | Nictitating membrane | پێڵوی سێهەم، پەردەیەكی تەنكە لە چاوی هەندێك گیانداری بڕبڕەداری وەكو بۆقدا لە گۆشەی ناوەوەی چاودا دیارە. |
| غشاء الطبلة | Tympanic membrane, Myrinx | پەردەی گوێ، تەپڵی گوێ. |
| غشاء دبوف | | پەردەی دیبۆف، چینێكە لە خانە، لە پەردە لینجەكەی بۆری هەوا و لقەكانیدا نوقوم بووە. |
| غشاء كاذب، غشاء الدفتريا | False- membrane | پەردەی درۆزنە، گەندە پەردە، ئەو پەردەیەی كە لە قورگدا پەیدا دەبێت لە ئەنجامی نەخۆشی دفتریا (وەناق)ەوە. |
| غشاء زجاجي | Glassy membrane | پەردەی شووشەیی لە چاودا. |
| غشاء هكسلي ، غمد الشعرة | | پەردەی هێكسلی، كالانی موو. |
| غشاء بين العظام | Interosseous membrane | پەردەی نێوان ئێسكەكان، وەكو پەردەی نێوان قامیشە و تەلەزمی لاق. |
| غشاء صديدي | Pyogenic membrane | پەردەی كێماوی، پەردەی ناوەوەی دومەڵ. |
| غشاء شنيدر | Schneiderian membrane | پەردەی شنیدەر، پەردەی چڵمینی ناوەوەی بۆشاییەكانی لووت. |
| غشاء تنون | | پەردەی تینۆن، پەردەی دەوروپشتی چاو. |
| غشاء انبوني للعصب، غشاء العصب | Neurilemma, Tubular membrane | پەردەی دەمار، پەردەی شێوە بۆری دەوروپشتی گەدە. |
| غشاء صغير، غُشيء | Membranula, Membranule | پەردەی بچووك ، پەردۆكە، پەردۆڵە، وەكو باڵی هەندێك مێروو. |
| غشاء بومان | | پەردەی بۆمان، پەردەیەكی ڕوونە دەكەوێتە ژێر وشكێنەی (كۆرنیای) چاوەوە. |
| غشاء دسمت | | پەردەی دیسمێت، پەردەی ناوەوە یان پشتەوەی وشكێنەی ( كۆرنیای) چاو . |
| غشاء الشريان | Fenestrated membrane | پەردەی خوێنبەر، پەردەیەكی لاستیكی‌یە بۆ بۆری خوێنبەر لە ناوەوە. |
| غشاء الخلية، غشاء البلازما | Cell membrane, Plasma membrane | دیواری شانە، پەردەی شانە، پەردەی سێڵ . |
| غشاء نووي | Nuclear membrane | پەردەی ناوكی، پەردەی ناوكی خانە. |
| غشاء سايتوپلازمي | Cytoplasm membrane | پەردەی سایتۆپلازمی، پەردەی دیوی دەرەوەی سایتۆپلازمی خانە . |
| غشاء جلدي | Leathery-tegmen | پەردەی پێستی. |
| غشاء يربط اسفل اللسان بقعر الفم، لجام اللسان | Frenum | پەردەی ژێرزمان، لغاوی زمان. |
| غشاء متقرن | Cornified-membrane | پەردەی ڕەق. |
| غشاء بلازمي، غشاء البلازما | Plasmolemma | پەردەی پلازمی<br>١-پەردەی دەوری لەشی هەندێك گیانداری وەكو ئەمیبا .<br>٢-ئەو پەردە تەنكەی كە لە دیوی دەرەوە پلازمی خانەی داپۆشیوە. |
| غشاء إهتزازي | Vibrating-diaphragm | پەردەی لەرۆك. |

| | | |
|---|---|---|
| غشاء البكارة، غشاء عذرة | Hymen, Virginal membrane | بنی کچ، پەردەی کچێتی، پەردەی ئافرەت، پەردەی کەنیشکی، بن، پەردەی کچێنی . |
| غشاء مثقب | Fenestrated membrane | پەردەی کونیلەدار. |
| غشاء العصب | Neurilemma | پەردەی دەمار، بەرگی دەمار. |
| غشاء الإخصاب | Fertilization membrane | پەردەی پیتێـن، ئـەو پەردەیەیـەی کـە دەوری گـەرا ( هێلکـە) دەدات دوای پیتێن بۆ نەهێشتنی چوونە ژوورەوەی سپێرمی تر . |
| غشائي | Membranous, Membraneous, Membranceous | پەردمیی، شتێك پەیوەندی بە پەردەوە هەبێت . |
| غشاء الجنين، غشاء جنيني | Embryonic membrane, Fetal membrane | پـەردەی کۆرپەلـە، پـەردەی دەوروپشتی منداڵـی سـاوا لـە سـکی دایکیـدا، بریتی‌یە لە پەردەی ئەفنیۆن و کۆریۆن و ئەلانتویس. |
| غشاء الأم القاسية، غشاء الأم الجافية | Duramater | بەشی سەرەوەی پەردەی مێشك. |
| غشاء الأم الحنون | Piamater, Localis membrane | بەشی ژێرەوەی پەردەی مێشك. |
| غشاء عنكبوتي ، عنكبوتية | Arachnoid membrane | بەشی ناوەڕاستی پەردەی مێشك. |
| غشاء منباري، غشاء سجقي، غشاء معوي ، سلا | Allantois- membrane , Intestinalis membrane | پەردەی ریخۆڵە . |
| غشاء مفصلي مزلقي، غشاء زلالي | Synovial membrane | پـەردەی جومگـەیی خلیسـك، پـەردەی پرۆتیـنی، پەردەیەکـە دەکەوێتـە جەمسەری ئێسکە جومگەدارەکانەوە . |
| غشاء صفاقي | Aponeurosis fascia | چەرمەچەقاڵتە، چەرمەچەقیلە، چەق. |
| غشاء القلب، شخاف القلب، تامور، غشاء التامور | Pericardium, Pericardial membrane | پەردەی دڵ. |
| غشائيات، فطور غشائية | Hymenomy-cetes | قارچکە پەردەیی‌یەکان وەکو ئەو قارچکەی لە چەتر دەچێت. |
| غشائيات الأجنحة | Hymenoptera symphytes | باڵ پەردەییەکان، کۆمەڵێکە لە مێروو، چوار باڵیان هەیە، دەمیان مژۆکە، چزویان هەیە وەکو هەنگ و زەردەواڵە. |
| غشاء رايسنر | Reissner membrane | پەردەی رایسنەر، پەردەیەکە دەوری قاقڵەی گوێچکەی داوە. |
| غشاء كراوس | | پەردەی کراوس، بەشێکی کاڵە لە پەردەی ماسولکە. |
| غشاء نخامي | Pituitary- membrane | پەردەی پیتویتەری، پەردەی چڵمی. |
| غشاء مصلي | Serous- membrane | پەردەی زینچکاویی. |
| غشاوة، غشوة | Covering, Envelope | لێڵی،تەم. |
| غشوة، صقلاب | Asclepias | ڕووەکێکی دوولەتکەیی‌یە لە کۆمەڵەی ژاڵەیە. |
| غشاوة العين | Spot on the cornea, Film on the eye | تارمایی چاو، لێڵایی چاو، تەمی چاو. |
| غشيم | Unskilful, Awkward, Untrained | نەفام، نابەڵەد، ناشارەزا. |
| غشيش، غُش الغنم | Liver-fluke | کرمی جگەر، نەخۆشی پەپوولە لە مەڕو ماڵاتدا. |
| غشيان، غشية | Swooning, Syncope, Fainting | بوورانەوە، بێهۆشبوون، لە هۆشخۆچوون، لەخۆچوون. |

| | | |
|---|---|---|
| غُشيّ | Hymenium | پەردۆكە، پەردەیەكی بچووك وەكو ئەوەی لە قارچكدا هەیە. |
| غصب، إغتصاب | Coercion | زەوتكردن. |
| غصب النساء، إغتصاب النساء | Ravishment, Violation, Rape | ژن زەوتكردن، ژن داگیركردن، پەلاماردانی ژن. |
| غصب الأموال | Robbing, Extortion | ماڵ داگیركردن. |
| غُصة | Choker, Lumpinthroat | گەروگر، هەر شتێك بە تایبەتی خواردەمەنی كە لە گەروودا بگیرێت و نەچێتە خوارەوە. |
| غصص | Choking | گەرووگیران، گیرانی شتومەك، بە تایبەتی خواردەمەنی لە گەروودا . |
| غصص الموت، غصة الموت | Death-rattle | گیانەڵا، گیاندان، كاتی گیان دەرچوون، سەرەمەرگ، ئاوزینك. |
| غصن، فند | Branch, Bough, Bow | لق، چڵ، تووڵ، شووڵ، پۆپ، تەرح، بر، وەچ، بژگ. |
| غصن التطعيم | Scion, Graft | لقی متوربە، ئەو لقی ڕووەكەی كە بۆ متوربە ئامادە دەكرێت . |
| غصن طري | Tender branch | لقی تەڕ. |
| غُصن عرضي | Sucker | لقی لابەلا، ئەو لقەی كەلەسەر ڕەگ پەیدا دەبێت . |
| غصن مورق | Leafy branch | پەلوپۆ، لقی گەڵادار. |
| غصين | Twig, Shoot, Spray | وەچ، لقۆكە، چڵی باریك. |
| غضّ، ناضر | Luxuriant, Lush | ئاودار، تەڕ، ناسك، نیان، پاراو، تەرچك. |
| غضّ بضّ | Tender, Soft | غەزوبەز، گۆشتن، زۆر قەڵەو، ئاژەڵی قەڵەو. |
| غضّ الطرف | Over looking | سەیری سەرەوە كردن. |
| غض النظر | Regardless | چاوپۆشین. |
| غضاة، اثل سوري | Syrian-tamarisk | دارگەزی سوری، جۆرە درەختێكە لە دار گەز دەچێت ، تەختەكەی ڕەقە، پشكۆی ئاگرەكەی زۆر دەوام دەكات . |
| غضارة، نضارة | Luxuriance, Lush, Plethora | پاراوی، تێر ئاوی . |
| غضانة | Tunica | تونیكا، گیایەكە لە كۆمەڵەی مێخەك، گوڵی هەمەڕەنگە دەكرێت . |
| غضار، دلغان، صلصال | Clay, Loam | جۆرە خۆڵێكی ڕەقی مەیلە و سەوزە بۆ دروستكردنی گلێنە بەكاردێت، بریتی‌یە لە سلیكاتی ئەلەمنیۆمی ئاویی و ئۆكسیدی ئاسن و مەنگەنیز . |
| غضان، إجهاض | Abortion | لەبارچوون، لەبارچوونی ساوا. |
| غضارة | Plethora | خێرا گەورەبوونی ڕووەك. |
| غضاري | Clayey | گڵی، قوڕیی، شتێك پەیوەندی بە گڵ و قوڕەوە هەبێت . |
| غضاضة، طراوة | Tenderness, Lushness | ئاوداریی، تەڕیی، پاراوی. |
| غضب | Anger | قۆشقێتی، تووڕەیی، تووڕەبوون، پێش خواردنەوە. |
| غضب جنوبي | Frenzy | تووڕەبوونی شێتانە. |
| غضبان، غضب | Angry | قوشقی ، قەڵس، قاس، زویر، تووڕە. |
| غضبة | Difficult in cooking | نەكڵۆك، وەكو نۆك و فاسۆلیای نەكڵۆك. |
| غُضروف، غرضوف | Cartilage, Gristle, Cartilago | كركراگە، قرتێنكە، خرموتە، خرۆچك، خرێنچكە، مادەیەكی قایمی نەرمە لە كۆتایی ئێسكدا هەیە. |
| غضرفة، تغضرف | Chondrogenesis, Cartilaginification | كركراگەبوون، بوونە كركراگە، دروستبوونی كركراگە. |

| | | |
|---|---|---|
| غضروفيات الزعانف | Chondropterygll | پەرەکە کرکراگەیی، وەکو سەگەماسی. |
| غضروفي | Cartilaginous, Gristly | کرکراگەیی، قرتینکەیی. |
| غضروف لشكة | | کرکراگەی لەشکە، کرکراگەیەکە لەژێی دەنگدا لە قورگدا. |
| غضروف حلقي | Annufar-cartilage, Cricoid cartilage | کرکراگەی ئەڵقەیی. ١- کرکراگەی ناوەمی گیانداری لامیری ( گیاندارێکە لە ماسی دەچێت). ٢- کرکراگەی خوارەوەی قورگ. |
| غضروف متكلس | Calcified cartilage | کرکراگەی کلساوی‌بوو، کرکراگەی ڕەقەوەبوو. |
| غضروف موصل | Connecling cartilage | کرکراگەی گەێنەر. |
| غضروف مرن | Elastic cartilage | کرکراگەی نەرم. |
| غضروف دائم | Permanent cartilage | کرکراگەی هەمیشەیی. |
| غضروف رئوي | Pulmonary cartilage | کرکراگەی سی. |
| غضروف شبكي | Reticular cartilage | کرکراگەی تۆڕیی. |
| غضروف اصفر | Yellow cartilage | کرکراگەی زەرد. |
| غضروف منقاري، غضروف خطمي | Rostral cartilage | کرکراگەی دەنووکی، کرکراگەی لموزیی، وەکو ئەو کرکراگەیەی کە لە لموزی هەندێك ماسیدا هەیە. |
| غضروف تنفسي | Spiracular- cartilage | کرکراگەی هەناسەیی، کرکراگەیەکە لە دەوروپشتی کونی هەناسەدان ، وەکو لە ماسی‌یە کرکراگەدارەکاندا. |
| غضروف الرغامي | Tracheal cartilage | کرکراگەی بۆری هەوا، ئەو کرکراگەییانەی کە بۆری هەوا یان لقی بۆری هەوایان لێ‌پێکدێت لە گیاندارە بڕبڕەدارەکاندا. |
| غضروف خنجري، علعل | Xiphoid cartilage, Ensiform- cartilage | کرکراگەی خەنجەریی، پارچەی سێهەم لە کۆڵەی سنگ، کۆتایی کۆڵەی سنگ. |
| غضروف الأذن، فوف، قرقش الأذن | Ear- cartilage | کرکراگەی گوێ. |
| غضروف ميكل | | کرکراگەی میکل، کرکراگەی چەناگە لە منداڵی ساوادا. |
| غضروف الأنف | Nasal cartilage | کرکراگەی لووت. |
| غضروف ليفي | Fibrocartilage | کرکراگەی ڕیشاڵیی، جۆرێکە لە کرکراگە ، ریشاڵی سپی زۆر تێدایە . |
| غضروف شفاف، غضروف زجاجي | Hyaline- cartllage | کرکراگەی ڕوون، جۆرێکە لە کرکراگەی ڕوون، وەکو کرکراگەی قورگ و بۆری هەوا.. |
| غضرم | | سلیکاتی ئەلەمنیۆم، وەکو فیلدسپار و میکا، جۆرێکە لە کەرەسەی خاو. |
| غضير، ريان | Luxuriant, Lush | تێرئاو، پاراو. |
| غضراء، مرجة | Lawn, Greensward | سەوزەڵانی، زەوییەك بە گژوگیا داپۆشرابێت . |
| غضفاء، قنفاء (أذن) | Macrotes | گوێچکەی گەورەی شۆڕ. |
| غضف الجلد، لين الجلد | Chalazoderma, Dermatolysis | نەرمبوونەوەی پێست . |
| غضف، جوني | Syrrhaptes, Black-belliedsand-grouse, Imperial sandgrouse, Pterocles-orientalis | شاقەتیێ، جۆرێکە لە قەتێ، لە کۆتر دەچێت ڕەنگەکەی زەردە هێڵی قاوەیی تێدایە، کلکی درێژە لە عێراق و سوریا هەیە . |
| غضن، تجعد، ثنية | Wrinkle, Tunica, Crease | چرچولۆچی ڕوو یان پێست یان جل، چرچی ڕوو. |

| | | |
|---|---|---|
| غضن، متغضن | Wrinkled | چرچ، لۆچ. |
| غضنة | Thrombosis | قەتماغەی سەر برین. |
| غضنفر | Lion | شێر. |
| غضوف | Saccopteryx | جۆرێکە لە شەمشەمەکوێرە. |
| غضوب، سريع الغضب | Choleric | تورەوترۆ، کەسێك زۆر زوو تورە ببێت. |
| غضير | Plethoric | رووەکی نەرم و نیان و تەرو بڕ. |
| غضيض، ولد المهاة | Young of addax | بەچکەی مانگاکێوی. |
| غطاء | Bush, Plug, Lid, Apron, Cover, Tegmen | سەرقاپ، سەپۆش، پۆشەر، دەرپوشك، پشك. |
| غطاء خيشومي، غطاء، غلصمي | Operculum of fish, Gill-cover | سەرقاپی کەوانەی ڕیشەدار لە ماسیدا. |
| غطاء فخاري | Earthen warelid | دەرخۆنە. |
| غطاء نباتي | Vegetation (vegeral) cover | بەرگی رووەکی، سەرجەمی ئەو رووەکانەی کە ناوچەیەکی تایبەتیان داپۆشیوە. |
| غطاء السرير | Bed-spread, Coverlet, Bed sheet | سەرجێ، چەرچەف. |
| غطاء الدفيئة | Shade frame | ئەو حەسیر و کا و قامیشەی کە رووەکی پێدادەپۆشرێت بۆ مەبەستی سێبەر . |
| غطاء صوفي | Woolen blanket, Woolen sheet | جاجم، بەتانی، پەتوو. |
| غطاء السرج | Saddle cover | زین پۆش، سەرزین. |
| غطاء المائدة | Table cloth, Table cover | سفرە، سەرمێز. |
| غطاء زجاجي، غطاء الشريحة | Cover glass, Cover slide | سەرقاپی شووشە، رووپۆشی شووشە، پارچە شووشەیەکی بچووکی خڕی تەنکە دەخرێتە سەر توێژاڵی شووشەی ژێر میکرۆسکۆپ. |
| غطاء الرأس | | سەرپۆش ، پۆتەلاك، کڵاو. |
| غطاء لولبي، سَداد ملولب | Screw cap | سەرقاپی برغوودار، سەرقاپی مارپێچی. |
| غطاء للأواني | Lid | سەرقاپ ، قەپاخ، دەرخوون، قەرام. |
| غطائي | Opercular | سەرقاپی، شتێك پەیوەندی بە سەرقاپەوە هەبێت. |
| غطاط، غطاة، قطاة صحراوية | Sandgrouse pterocles, Senegalensis, Singed sandgrouse | قەتێی بیابان. |
| غطّاس ، غماس، غوّاص | Dipper, Podiceps grebe, Loon | کەرسەرە، پێ درێژە ، جۆرێکە لە قەلەرەشکە باڵندەیەکی مل درێژە، سەری نێرەکەی پۆپنەیەکی پێوەیە لەشێوەی تەوق یان شاخدایە، خۆی لە ئاودا نقوم دەکات . |
| غطاس متوّج | Crested grebe | ماسیگرەی کڵاودار. |
| غطاس، غواص | Diver | مەلەوان، ئەوانەی کە خۆیان نوقم دەکەن لە ژێر ئاودا. |
| غطرسة | Insolence | لە خۆبایی بوون. |
| غطريف | Young goshawk | بەچکەی باز. |
| غطرب | Snake, serpent | مار. |

| | | |
|---|---|---|
| غطرف | Whitefly | مێشه سپی، مێروویەکی زیان بەخشه له درەختی مزرەمەنیيەکانی ( وەکو پرتەقاڵ و هەنار) و پاقله و لۆکه دەدات . |
| غطس، غطّ | Diving, Plunging | چوونه ژێر ئاو، نوقمبوون له ئاودا. |
| غطلس، ذئب | Wolf | گورگ. |
| غطيط، شخير | Snaring | پرخه، پرخەپرخ، لرخه، لرخەلرخ. |
| غطيطة، ضباب | Pea-souper, Fog | تەم. |
| غفث، خد البنت | Water hemp, Hemp weed, Hemp agrimony | گوشی ئاویی، دەوەنێکه گەڵاکەی له پەنجه دەچێت، گوڵەکەی پەمەيیه بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت . |
| غفر | | ئەو کەسەیه کە تووکی لەشی هەر گەنگەموو بێ. |
| غُفرة، غفارة | | بروانه (غطاء الراس) . |
| غفوة | Adoze, Nap, Slumber | سەرخەو، خەوبردنەوە، سوکەنوستن، بیره خەو، نوستنی سووک، نێوان خەو و بێداری. |
| غفر، تيل، ظبي أسود | Cervicapra | ئاسکه ڕەشه، مامزەرەشه، جۆرێکه له ئاسکەکێوی، ڕەنگەکەی ڕەشه. |
| غفرية | Powder post, Beetle | جۆره مێروویەکی زیان بەخشه بە ئارد و نان و کاغەز ، ڕەنگەکەی مەیله و سووره. |
| غُفل، مجهول الأسم | Anonymous | بێناو. |
| غفو، نرجس الشعراء | | نێرگزی شاعیران، جۆرێکه له نێرگز. |
| غفير، خفير، حارس | Gudard, Watchman | پاساوڵ، پاسەوان، وەردیان . |
| غلّ، إغتماد | Invagination | چوونی شانەیەکی زیندوو بە شانەیەکیتردا، ئەگەر ئەمە له ریخۆڵەدا ڕوویدات دەبێته هۆی مردن. |
| غلُ، قيد، ( اغلال) | Irons, Fetters shacles | تەوق، کۆت، پەیوەند، پابەند، پەبەن، پاشبەند، تەوقێکی ئاسن یان چەرم دەکرێته دەست یان ملەوە. |
| غلّ | Gill net | تۆڕی ماسی گرتن. |
| غلاف | Integument, Tegument, Shell, Cover, Envelope, Ocrea, Sheath, Theca | بەرگ، کاڵۆخ، توێکڵ. |
| غلاف الجسم | Perisarc | بەرگی لەش، وەکو له گیاندارە بۆش ریخۆڵەییەکاندا. |
| غلاف جوزة القطن | Nutshell | گاڵ، توێکڵی قۆزاخەی لۆکه. |
| غلاف الثمرة الخارجي | Pericarp | توێکڵی دەرەوەی بەری درەخت. |
| غلاف الثمرة الأوسط | Meso carp | توێکڵی ناوەڕاستی بەری درەخت . |
| غلاف الثمرة الداخلي | Indo carp | توێکڵی ناوەوەی بەری درەخت. |
| غلاف الحافر | Crust (of hoof) | بەرگی سم، دیوی دەرەوەی سم. |
| غلاف شوكي، سفا | Bur, Burr | بەرگی درکاویی، وەکو بە هەندێك دانەوێڵەوە هەیه. |
| غلاف الكلية | Perinephrium | بەرگی گورچیله، توێکڵی گورچیله. |
| غلاف جوي | Atmosphere | بەرگەهەوا، ( ئەتموسفێر) ئەو بەرگە هەوایەی کە دەوری خرۆکی زەوی داوە بە ئەستووراییی نزیکەی ٥٠٠میل. |
| غلاف ترابي | Pedosphere | بەرگی خۆڵی، بەرگی گڵی، بەرگی سەرەوەی زەوی کە زیندەوەر له ناویدا یان لەسەریدا دەژی. |
| غلاف باطني، قطمير، سيراء | Secundine | بەرگی ناوەوە، بەرگی ناوپۆش وەکو بەرگی ناوەوەی گەرای ( تۆوی ) ڕووەك. |

| | | |
|---|---|---|
| غلاف الحبل الشوكي | Theca vertebralis | بەرگی مەغزی دڕکاوی. |
| غلاف شوان | Primitive-sheath | بەرگی شوان، ئەو بەرگەی کە دەوری ریشاڵی دەماری داوە. |
| غلاف الليفية العضلية | Sarcolemma | بەرگی ریشاڵی ماسولکە. |
| غلاف الليفية العصبية | Neurilemma | بەرگی ریشاڵی دەماریی . |
| غلاف ملون | Chromosphere | بەرگە ڕەنگین، بەرگی ڕەنگاوڕەنگ، چینێکی گازی ڕوناکی مەیلە و سوورە، لە بەرگی خۆر بە شێوەیەکی گشتی ئەو بەرگە گازییەیە کە دەوری ئەستێرەکانی داوە. |
| غلاف حيوي | Biosphere | بەرگی زیندەگی، ئەو ناوچانەیە لە ڕووی زەوی و هەوای دەوروپشتی کە گیانەوەر و ڕووەکی تێدا دەژی . |
| غلاف ضوئي | Photosphere | فۆتۆسفێر، بەرگی ڕووناکی، ئەو بەرگە گازییە بینراوەیە کە دەوری خۆر یان ئەستێرەیەکی داوە، ئەستووری بەرگی ڕووناکی خۆر سەدەها کیلۆمەتر دەبێت و پلەی گەرمییەکەی (٥٥٠٠) پلەی سەدی دەبێت . |
| غلاف جوي سفلي، تروبوسفير | Troposphere | ترۆپۆسفێر، بەرگی هەوایی خوارووی، بەشێکە لە بەرگی هەوایی دەوری خرۆکی زەوی نزیکەی (٩٠٠٠) هەتا (١٨٠٠٠) مەتر ئەستوورە، پشێوی هەوایی تیادا ڕوودەدات . |
| جوي طبقي ، ستراتوسفير | Stratosphere | ستراتۆسفێر، بەرگی هەوایی چینی ، چینێکە لە بەرگی هەوا (١٠-٨٠) کیلۆمەتر لە ڕووی زەوییەوە هەڵمی ئاو و تەپوتۆزی تیادا نییە و بە دەگمەن هەوری تیا پەیدا دەبێت. |
| غلاف جوي متأين | Ionosphere | بەرگی هەوایی ئایۆناویی، بەشێکە لە بەرگی هەوا (٨٠-١٠٠٠) کیلۆمەتر بەرزە لە ڕووی زەوییەوە شەپۆلی ڕادیۆ دەگەڕێنێتەوە بۆ زەوی. |
| غلاف مائي | Hydrosphere | بەرگی ئاویی، ( هایدرۆسفێر) ئەو ئاوی ڕووبار و گۆم و دەریا و زەریایانەی کە نزیکەی ٧٢٪ ی ڕووی گۆی زەویان داپۆشیوە. |
| غلاف البيضة | Egg-case ootheca | بەرگی هێلکە. |
| غلاف العصب | Epineurium | بەرگی دەمار، پەردەی دەمار. |
| غلاف الخرقة العصبية | Perineurium | بەرگی چەپکەدەمار. |
| غلاف الخرطوش | Almosphere | بەرگی فیشەك. |
| غلاف العضلة | Epimysium | بەرگی ماسولکە، پەردەی ماسولکە. |
| غلاف الكتروني | Electron shell | بەرگی ئەلەکترۆنی ، ئەو بەرگانەی کە لە گەردیلەی مادەدا هەن و ئەلەکترۆنیان تیادایە. |
| غلاف، ظرف | Envelope | زەرف، زەرفی نامە. |
| غلادستونية | Gladstone | گلادستۆن، جۆرە باوڵێکە ( جانتایەکە) لە ناوەڕاستدا دەکرێتەوە . |
| غلاية | Kettle | کتری، کتلی. |
| غلاية القهوة، تنكة قهوة | Coffe-pot | جەزوەی قاوە. |
| غلاية، سخانة | Boilder, Cauldron | بۆیلەر، گیزەر، قازانی کوڵاندن، وەکو ئەو بۆیلەرانەی کە بە نەوت یان گاز کار دەکەن. |
| غُلام، فتى | Youth, Boy, Lad | کوڕ، لاو. |
| غلاليات، زقاق البحر | Sea-peach, Tunicata, Ascidian | قۆخی دەریا، مەشکەی دەریا، کۆمەڵە گیانداریکی دەریایی نەرمە، لەشی بە پێستێك دەورەدراوە و دوو کونی تێدایە ، لە پێشەوە و لە دواوە. |

| | | |
|---|---|---|
| غلاظ الشعر | Kemp, Coarse hairs | مووییەکی ئەستووره لە نێوان خوریدا بۆیە ( رەنگ) ناگرێت. |
| غلامية، استرجالية | Virilism | نێره، کورانێتی، ژنێك رەوشتی پیاوی تێدابێت . |
| غلامية، يفع | Adolescence | هەرزەکاری ، گەنجێتی، لاوێتی. |
| غلاء، شفش | Umbra | ئەمبرا، جۆرێکە لە ماسی رەنگەکەی قاوەیی مەیلە و خاکی‌یە. |
| غُلان | Gladiculus | گلادیکولەس، ماسی‌یەکی دەریایی چاوگەورەیە. |
| غلاء | Dearness, Highcost | گرانی. |
| غلالة | Under garment | ژێرکراس، ئەتەگ. |
| غلالة | Tunic, Lunica | پێستە، پەردە. |
| غلالة بيضاء | Albuginea | چینێکی سپی رەقە وەکو ئەوەی کە لە چاودا هەیە. |
| غلاديشيا، غسوة | Gleditsia, Gleditschia, Honey locust, Locust tree | گلادیشـیا، درەختێکـی درکاوییـە درکەکـەی سـێ سـووچکەییە بـۆ رازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت . |
| غلبة، سيادة | Dominance | زاڵبون، زاڵی. |
| غلبة، ظفر، فوز | Conquest | سەرکەوتن، بەسەردا زاڵبوون. |
| غلب | Trachelopanus | ئاوسانی گرێی مل. |
| غلبرت، جلبرت | Gilbert | جلبەرت، یەکەی هێزی پاڵنەری موگناتیس. |
| غلبادية | Gallopade | گالیپێد، جۆرە سەمایەك یان مۆسیقایەکە. |
| غلة، غلال، ريع | Corn, Crops, Yield, Revenue, Income, Produce, Cereals, Out-turn | دەغڵودان، بەروبووم، دانەوێڵە، خەلە، خەلەوخەرمان. |
| غلة عقارية، ريع عقاري | Ground rent | کرێی زەوی، کە لە قازانجی خەلەوە دەردەچێت. |
| غُلّة، غليل | Burning-thirst | تینوێتییەکی زۆر. |
| غلتين | Galantine | سینی‌یەك، ماسی یان گۆشتی ساردی لەسەر بێت بۆ خواردن . |
| غلتونيا | Galtonia | گالتۆنیا، رووەکێکی رازاندنەوەیە لە کۆمەڵەی زەمەق، گوڵەکەی لە رەحەتی دەچێت و گەورە و سپی و شۆڕە. |
| غلث، قصارة | Siftings, Riddlings | سەرکۆزەر، بن بێژنگ، ئەو تۆوە بچووکانەی (زۆرلەك) و پوش و پەلاشەی کە لە ئەنجامی بێژانەوەی دانەوێڵەوە پەیدا دەبێت . |
| غلروق، خنفساء الورقة | Galeruca | گالیروکا، قالۆنچەی گەلاخۆر. |
| غلس | Dusk, Twilight | کۆتایی شەو، بەرەبەیان. |
| غلصمة، لغد، غبب | Gill | گۆشتی لامل، غەبغەبە. |
| غلصم، خيشوم | Gill | کەوانەی ڕیشەدار وەکو لە ماسیدا. |
| غلصمة الحلق، لهاة | Epiglottis | زمانە چکۆلە. |
| غلط، غلطة | Mistake, Fault, Error | هەڵە، چەوتی، غەڵەت، ناراست. |
| غلطة كتابية | Clerical error | هەڵەی نوسین. |
| غلطة مطبعية | | هەڵەی چاپ. |
| غلظ. غلظة | Thickness | ئەستووریی. |
| غُلفة الذكر، قلفة، غُرلة | Foreskin, Prepuce | پێستی سەری چووك ( کێر) . |
| غلف | Caralluma, Carrion flower | کارلوما، رووەکێکی بیابانی‌یە، گەڵا و گوڵەکەی ئەستورن. |
| غلفنة، غلونة | Galvanization | چینکۆکردن، رووکەشکردنی ئاسن بە توتیا. |

| | | |
|---|---|---|
| غلفانوسكوب، منظار غلفاني، جلفانوسكوب | Galvanoscope | گلفانۆسکۆپ، دۆزەرەوەی بون و ڕێرەوی تەوژمی کارەبا. |
| غلفانومتر، جلفانومتر، كلفانومتر، مقياس كلفاني | Galvanometer | گلڤانۆمیتەر، ئامرازێکە بۆ زانینی ڕەوشتی تەوژمی کارەبایی. |
| كلفاني، غلفاني، جلفاني، غلواني، كلفاني | Galvanic, Galvano | گلفانی، شتێك پەیوەندی هەبێت بە تەوژمی کارەباوە، شتێك کارەبا پەیدا بکات بە ڕێگەی کارلێکی کیمیایی. |
| غلق | To close | داخستن. |
| غلق، إطباق | Occulusion | داخستن، لێکنان، وەکو چاولێکنان. |
| غلقة، صقلاب مخزني | Tamepoison | دەوەنێکی پزیشکی‌یە، شیراوێکی دژی ژەهری تێدایە، گوڵەکەی سپی‌یە. |
| غلمة | Tentigo, Lust, Satyriasis | ئارەزوو، هەوەس، ئارەزووی جووتگرتن. |
| غلمة الروائح | Osmolagnia | ئارەزووی بۆن، هەوەسی بۆن، حەز لەبۆنکردن. |
| غلمة الرؤية | Mixoscopia | ئارەزووی سەیرکردن، هەوەسی سەیرکردن. |
| غلمة السرقة | Kleptolagnia | ئارەزووی دزین، هەوەسی دزین. |
| غلمة البول | Urolagnia | ئارەزووی میزکردن، هەوەسی میزکردن. |
| غلمة، إغتلام، شبق | Sexual urge, Nymphomania, Carnal appetite, Lust | ئالۆشی جووتگرتن، حەشەرێتی، هەوەسی جووتگرتن، ئارەزووی جووتگرتن، بەکەڵی، بەتەڵەبی. |
| غلموت | Guillemot | گیلیمۆت، باڵندەیەکە لە دەریا باکووریەکاندا دەژی. |
| غلندة، فأر الثيل | Golunda | گەلەندە، مشکی چیمەن، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە مشك دەچێت، بچووکە و ڕەنگەکەی قاوەیی مەیلە و ڕەشە، ژێر سکی سپی‌یە، گیای چیمەن دەخوات . |
| غلنبرية | Gallinipper | گالینیپێر، مێشوولەیەکی ئەمریکی گەورەیە. |
| غُلوان، ريعان | Prime, Spring of life | هەرەتی گەنجی. |
| غلوبة | Galloway | گالۆوەی، مانگایەکی سکۆتلەندی‌یە. |
| غلومة، غلامية | Youth, Adolescence | گەنجێتی ، لاوی. |
| غلوكسينية، سلطان | Gloxionia | گلۆکسینیا، گیایەکە گوڵەکەی گەورە و جوانە لە شێوەی زوڕنادایە، ڕەنگەکەی سووری هەناری‌یە. |
| غلوكوما، زرق | Glaucoma | گلوکۆما، ئاوی شین، ئاوی ڕەشی چاو کە دایەت، نەخۆشی‌یەکە تووشی چاو دەبێت . |
| غلوكوسيد، جلوكوسيد | Glucoside | گلوکۆسید، ئاوێتەیەکی ئەندامی‌یە لە ڕووەکدا گلوکۆزی زۆر تیادایە، ئاوێتەیەکە گلوکۆز پەیدا دەکات. |
| غلوكوز، كلوكوز | Glucose | گلوکۆز، شەکری ترێ. |
| غلوكونيت | Glauconite | گلوگۆنێت، سلیکاتی پۆتاسیۆم و ئاسنی ئاویی، ڕەنگەکەی سەوزە. |
| غلوسينيوم، بريليوم | Glucinum, Beryllium | گلۆسینیۆم، بریلیۆم، توخمێکی کانزای‌یە، ژمارەی گەردیلەیەکەی ٤ و کێشی گەردیلەیەکەی ( ٩) یە. |
| غلوبولين، غلوبيولين | Globulin | گلۆبیولین، مادەیەکە پرۆتینی‌یە لە خڕۆکە سوورەکاندا هەیە. |
| غلوكودوت | Glaucodote, Glaucodot | گلۆکۆدۆت، کەرەسەیەکی خاوە، ڕەنگەکەی سپی یان سەوزی زیوی‌یە، لە ڕەنگی تەنەکە دەچێت گۆگرد و زەرنیق و ئاسن و کۆبالتی تێدایە، لە شیلی هەیە یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی زەرنیق. |

| | | |
|---|---|---|
| غلوكوفين | Glaucophane | گلۆکۆفین، بریتی‌یە لە میتاسلیکاتی سۆدیۆم و مەگنیسیۆم و ئەلەمنیۆم لە بەردە ئاگرینەکاندا هەیە. |
| غلوكونات الأمونيوم | Ammonium-gluconate | گلۆکۆناتی ئامۆنیۆم، مادەیەکی کیمیایی‌یە. |
| غلوتامات الأمونيوم | Ammonium-glutamate | گلوتاماتی ئامۆنیۆم ، مادەیەکی کیمیایی ئەندامی‌یە. |
| غلوكنسبيل | Glockenspiel | گلۆکنسبیل، جۆرە ئامرازێکی مۆسیقایە ، بریتی‌یە لە شیشی ئاسنی شۆڕەوەبوو بە دوو چەکوشی بچووک لێدەدرێت . |
| غلوتامين | Glutamine | گلۆتامین، ترشێکی ئەمینی بلووری‌یە. |
| غلوبيريت | Glauberite | گلوبیریت، کەرەسەیەکی خاوە بریتی‌یە لە گۆگرداتی سۆدیۆم و کالیسیۆم ، رەنگەکەی خۆڵەمێشی یان زەردە، هەندێك جار بێڕەنگە یان سوورە، روون یان نیمچە روونە لە خوێی بەردیندا هەیە. |
| غلوكوسين، جلوكوسين | Glucocin | گلۆکۆسین، مادەیەکی کیمیایی ئەندامی‌یە. |
| غلوسيدم، جلوسيدم، سكرين | Glusidum, Saccharin | گلوسیدم، سوکەرین، ئاوێتەیەکە سەدەها جار لە شەکری ئاسایی شیرین ترە دەدرێت بەوانەی کە تووشی نەخۆشی شەکرە دەبن . |
| غلوري | Glowary | گلواری، دارشتەیەکە لە نیکل و ئاسن و کرۆم. |
| غلوبين | Globin | گلۆبین، پرۆتینی خوێن. |
| غلوطن، شرة | Glutton, Wolverine | بڕوانە ( شرە) . |
| غلونة، جلفنة | Galvanizing | چینکۆ کردن، داپۆشینی ئاسن بە توتیا دژی ژەنگ. |
| غلوتين | Gluten | گلۆتین، پێزە، مادەیەکی پۆرتینی لینجە لە ئاردا هەیە، پرۆتینی گەنم. |
| غليارة | Galliard | گالیارد، جۆرە سەمایەکی کۆنە. |
| غلي، غليان | Boiling, Ebullition | کوڵان، جۆش، هاتنەکوڵ، قوڵپەقوڵپ. |
| غليث | Maslin, Meslin | تێکەڵاوی دەنکی گەنم و جۆ. |
| غليم، شهواني | Lustful, Dissolute, Lewd | ئاڵۆشاویی، حەشەریی، کەسێك ئاڵۆشی ڕەگەزی تیادابێت. |
| غليظ | Thick, Coarse, Pyklnc | ئەستوور، توند، تونگ، قاڵی. |
| غليظ ( سابقة) | Pykno- | ئەستوور ( پێشگرێکە). |
| غليون | Tobacco pipe, Pipe | دارجگەرە، سەبیل، قەنە، قلیان، سەبیلە، مۆدنە، دەمنە. |
| غليون | Galleon | گالیۆن، کەشتی‌یەکی گەورەیە بە چارۆکە و سەوڵ کار دەکات . |
| غليون الأفيون | | وافور، قەنە و قلیانی تلیاك کێشان. |
| غليل، حقد | Grudge, Spite | بوغز، کینە. |
| غليارة | Galliard | گالیارد، جۆرە سەمایەکی کۆنە. |
| غليكوكول | Glycocol | گلیکۆکۆل، مادەیەکی کیمیایی ئەندامی‌یە. |
| غليكوسين | Glycocin | گلیکۆسین، مادەیەکی کیمیایی ئەندامی‌یە. |
| غليسين، سكر جلاتين | Glycin | گلیسین، شەکری جەلاتین، مادەیەکی کیمیایی ئەندامی‌یە. |
| غليسريت | Glycerite | گلیسریت، دەرمانێکە گلیسرینی تێدایە. |
| غليسروز | Glycerose, Tirose | گلیسرۆز، مادەیەکە لە گلیسرین وەرگیراوە. |
| غليكوسوريا | Glycosuria | گلیکۆسوریا، نەخۆشی شەکر، بوونی شەکر لە میزدا. |
| غليكوفاجوس | Glycyphagus, Sugarmites | (گلیکۆفاگەس)، مێروویەکە لە کۆمەڵەی مۆرانەی پەنیر. |
| غليسرتين | Glycyrrhetin | گلیسرتین، مادەیەکی تاڵە لە بنەبەلەك دەردەهێنرێت . |
| غليسرهزين | Glycyrrhizin | گلیسرهیزین، مادەیەکی شیرینە لە بنەبەلەك دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| غليسرين، جليسرين، غليسرول، جليسرول | Glycerine, Glycerol | گليسرين، گليسرۆل، جۆرێکە لە ئەلکهوول، شلەیەکی چەوری بێ ڕەنگە لە دروستکردنی تەقەمەنی و مەرەکەب و لە بواری پزیشکیدا بەکاردێت . |
| غليكول، خليكول | Glycol | گلیکۆل، ئەلکهوولی دوو هاوهێزی . |
| غليسريد، جليسريد | Glyceride | گليسريد، ئیثەری گليسرين لە دروستکردنی ڕۆن و بۆیەدا بەکاردێت. |
| غليكوبروتين | Glycoprotien | گلیکۆپرۆتین، مادەیەکی کیمیاییە. |
| غليكوجين، كلايكوجين، نشا حيواني، سكر الكبد | Glycogen | گلایکۆجین، شەکری جگەر، نیشاستەی گیاندار. |
| غليسين، بليحة | Glycine | گلايسين، گیایەکی کەپرییە، ڕەگەکەی بە شێوەی سەلکە لە هەڵووژە دەچێت و دەخورێت، گوڵەکەی سوور و بۆنخۆشە. |
| غليسميا، جليسيميا | Glycemia | گليسيميا، بوونی شەکر لە خوێندا. |
| غليادين | Gliadin | گليادين، مادەیەکی ئەلبۆمینییە لە ئاردا هەیە. |
| غليوكسال، كليوكسال، جليوكسال | Glyoxal | گلايۆکسال، مادەیەکی کیمایی ئەندامییە. |
| غليسارية، عشبة المنّ | Glyceria | گليسيريا، گیایەکی ئاویی تەمەن درێژە لە کۆمەڵەی دەغڵودانە. |
| غليسارية طافية | Glyceria-fluitans, Float grass, Manna grass | گیاگەزۆ، گليسيريای سەرئاوکەوتوو، جۆرێکە لە ڕووەکی گليساريا. |
| غمّ، كرب، حزن | Grief, Sorrow | خەم، خەفەت. |
| غماز السلاح الناري، زند البندقية | Trigger | پەلەپیتکە، پەلەپیتکەی تفەنگ. |
| غمازة الخدّ، نونة | Dimple | خاڵی دەستکرد لەسەر ڕوومەت، چاڵی سەر ڕوومەت. |
| غمام، رباب | White cloud, Cloud | هەوری سپی، هەور. |
| غمار القدم | Immersion-foot | پیرەلۆکبوونی قاچ، لەوەوە دەبێت کە قاچ بۆ ماوەیەکی زۆر لە ئاوی سارد دا بمێنێتەوە. |
| غمامة، غطاء العين | Eye bandage | چاوبەست. |
| غمامة ( على قرينة العين) | Nebula | تەمی سەرچاو. |
| غمامة العين، غمامة الفم | Blinker, Eye flap, Strapmuzzle, Muzzle | چاوبەستی وڵاخ، بەرچاوە، چەشمەك، دەمبەستی وڵاخ، ئامرازێکە دەمی وڵاخی پێدەبەسترێت بۆ ئەوەی خواردن نەخوات و گاز نەگرێت . |
| غماس الماء، غماسة | Diver, Dipper | باڵندەیەکی قەڵەوە، باڵ و کلکی کورتە سەر و دەنووکی قاوەییە و قاچی سوورە، لە مراوی دەچێت ، خۆی لە ئاودا نقوم دەکات . |
| غماء، سقف البيت | Ceiling | بنمیچ، سەربان، سەقف. |
| غمبار، اربيان | Prawn, Shrimp, Crangon | ڕۆبیان، گیاندارێکی دەریایی توێکڵدارە لە قرژاڵ دەچێت دەخورێت. |
| غمبير | Gambir | گامبیر، درەختێکی دەشتەکییە ئاوی گەڵاکەی مادەیەکی زەمقی تێدایە بۆ مەبەستی پزیشکی و پیشەسازی بەکاردێت . |
| غمة | Skull | کەللەی سەر، قەپوول، کرۆز، کاژەڵە، کاپۆڵ. |
| غمدٌ | Sheath, Elytron, Scabbard, Theca | کیف، قاوغ، کالان، کێلان، خلێف، کەلان، کاڤلان، کێلانی خەنجەر. |
| غمد الجناح | Wing-case | کالانەی باڵ، وەکو لە هەندێك مێروودا هەیە. |
| غمدية الأجنحة، مغمدة الأجنحة | Coleoptera | مێرووە باڵ کالانییەکان، کۆمەڵێکە لە مێروو، وەکو کولله. |
| غمد انبوبي | Ocrea | کالانە بۆریی، کالانێکە لە شێوەی بۆریدا دەورووپشتی هەندێك قەد و لقی ڕووەکی داوە. |

| | | |
|---|---|---|
| غمد الورقة | Pericladium | كالانى گەلاَ، وەكو لە گوڵەگەنم و جۆدا. |
| غمد عصبي | Neurilemma, Neurolemma | كالانى دەمارى . |
| غمرة | Eelgrass, Turtle-grass, Grass warck | گیاكیسەڵ، گیایەكى ئاوییە، قەدەكەى خشۆكە، گەڵاكەى دەزوولەییە، گوڵەكەى بە شێوەى هێشووە. |
| غمر، ورس | Ceylon cornel tree | دەوەنێكى دەشتەكى و كشتوكاڵییە، گوڵەكەى بە شێوەى هێشووى زەردە، رەنگێكى زەرد لە بەرەكەى دەردەهێنرێت. |
| غمر، إسقاء بالغمر | Submersion, Overflowing, Immersion | بەئاوداپۆشین، داپۆشین بە ئاو، وە لە كشتوكاڵدا بەكاردێت. |
| غمرة، شدّة | Agony, Throe | گەرمە، تین. |
| غمز لاطوعي، تلماح، رفّ الجفن، رمش تشنجي، رفيف، غمز | Blepharism, Blepharospasm | چاوفڕین، ئەوەیە كە پێڵووى چاو لە خۆیەوە بجووڵێتەوە . |
| غمز ، غمز بالعين | Winking, Nictation | چاوهەڵتەكاندن، چاو لێداگرتن، برۆ هەڵتەكاندن، خێسەكردن. |
| غمس، غطّ | Plonging, Dipping, Immersion | نقوم بوون، نقوم كردن. |
| غمش | Gamasus | گامەس، جۆرێكە لە گەنە. |
| غمش، غطش، كمش | Amblyopia | چاولێڵى، لێل بینین، تاریك داهاتنى چاو بەبێ ئەوەى كە نەخۆشى‌یەكى دیار لە ئارادا هەبێت. |
| غمص، رمص، عماص | Matter, (eye) discharge | ریپۆق. |
| غُمض، غماض، نوم | Slumber, Sleep | نوستن. |
| غمضة عين | Blink, Wink | چاونوقاندن. |
| غمق، ندى | Dew | شەونم، ئاورنگ. |
| غمق، عمق | Depth | قووڵى، قووڵایى. |
| غمل، غمن، صيانة | Bagging, Sacking | مێوەخستنە تورەكەوە بۆ مەبەستى پاراستنى. |
| غملينة، جملينة | Gemelina | گەملینا، جۆرە گیا و درەختێكە دەرمانى لێدەردەهێنرێت بۆ سنگ پێشە. |
| غملول | Prickly thrift, Armeria vulgaris | سپێناغە كێویلە، گیایەكى كشتوكاڵییە، گوڵەكەى سوورە و دەكرێت بە چێشت، گوڵەكەى دەرمانى میز پێ‌كردنى لێدەردەهێنرێت . |
| غملول، كرافيت، اسرب، اسروب | Graphite | گرافیت، جۆرێكە لە كاربۆن بۆ دروستكردنى قەڵەمى رەش بەكاردێت . |
| غملوج | Fruit-spur | لقێكى كورتى بەردار وەكو لە سێو و هەرمێدا . |
| غمم | Furrowed brow, Wrinkles of brow | چرچ و لۆچى ناوچەوان . |
| غموض، إبهام | Obscurity | نادیارى ، لێڵى. |
| غمنة، بودرة، مسحوق الزينة | Toilet powder | بۆدرەى ئارایشت. |
| غمون، سماد الأشنات | Seaweed | قەوزە، پەینى قەوزە. |
| غميضة، عياق إستغماية | | چاوشاركێ، جۆرە یارییەكى مندااڵنە. |
| غميضاء، غميصاء | | بروانە ( شعرى شامیە). |
| غميق، عميق | Deep | قووڵ. |
| غميلنيت | Gmelinite | گمیلینیت، كەرەسەیەكى خاوە، جۆرێكە لە زیولایت، رەنگەكەى سپییە، بریتییە لە سلیكاتى ئەلەمنیۆم و سۆدیۆم و كالیسیۆمى ئاوى. |
| غناء | Song, Singing | گۆرانى، زەمزەمە، ستران. |

| | | |
|---|---|---|
| غنام | Shepherd | شوان، شوانی مەڕ. |
| غنان، صوت الذباب | Humming, Buzzing | گیزە، گیزەگیز، وزە، وزەوز، دەنگی مێش. |
| غنافليون، صابون عفريت، برسية | Ganphalium | گنافالیۆم، ڕووەکێکە گوڵی سپی یان زەرد دەگرێت ، گوڵبەندی لێدروست دەکرێت . |
| غناثوسيروس | Gnathocerus | گناثۆسیرەس، قالۆنچەی ئارد، ئەسپێی ئارد. |
| غُنبول | Munia, Paddas | مونیا، پاداس، باڵندەیەکە لە چۆلەکە دەچێت سەری ڕەشە و ژێر سکی پەمەییە. |
| غُنّة، خُنّة | Sniffles, Snuffles | منگەمنگ، منگنی، قسەکردن بە لووت. |
| غنج، دلال | Coquetry, Dalliance, Prudery | ناز. |
| غنوجة، مغناج | Coquette | بەناز، ئافرەتی بەناز. |
| غنجة | She-hedgehog | مێی ژیشك، ژیشکی مێ. |
| غنجو | Drawbar | شیشی بەستنی فارگۆنەکانی شەمەندەفەر بە یەکترییەوە. |
| غنجل، عنفط، غناق الأرض | Caracal, Persian lynx | سیاگوش، گیاندارێکە لە کۆمەڵەی پشیلەکێوی. |
| غندب | | بڕوانە ( غبب، غبغب). |
| غُندي | Ctenodctylus, Gundi | (گوندی) گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە هێندەی کەروێشکێکی بچووك دەبێت، لە ناوچە بەردەڵانییەکاندا دەژی و گوێچکە و پشتی قاوەیی مەیلە و سوورە، ژێر سکی سپییە. |
| غندول، شختور | Gondola | گەندۆل، جۆرێکە لە بەلەم. |
| غندور، متانق في ملابسه | Dandy, Fop, Coxomb, Spark | شیك، قۆز، کەسێك جلوبەرگی ڕێکوپێك بێت . |
| غندر، سمين | Plump | قەڵەو. |
| غندقچي، سلاحي | Gunsmith, Armourer | چەخماخساز، ئەو کەسەی تفەنگ چاك دەکاتەوە. |
| غندصولي، زنبق زنجبيلي | Gingerlily, Garland flower | زەمەقی زەنجەفیلی، گیایەکە گوڵی زەرد یان ئەرخەوانی دەگرێت . |
| غنس | Gneiss | گنیس، جۆرە بەردێکی کریستاڵییە. |
| غنطوس | Gnathoncus | گناسۆنکەس، قالۆنچەیەکی ڕەشی خڕە. |
| غنغرينا، اكال ذرب، عطبة، موات موضعي | Gangrene | گەنگرینا، خۆرە، سەقاقلوس، تیراوی، شیبوونەوە و بۆگەنبوونی شانە و ئەندامەکانی لەش لە ئەنجامی برین و نەخۆشی شەکرە و وشکبوونەوەی خوێنبەرەوە دەبێت . |
| غنغرينا الديابيطس، غنغرينا السكري | Diabetic gangrene | گەنگرینای شەکرە، گەنگرینایەکە کە لە ئەنجامی نەخۆشی شەکرەوە دەبێت. |
| غنغرينا جافة | Dry gangrene | گەنگرینای وشك. |
| غنغرينا رطبة | Moist gangrene | گەنگرینای تەڕ، کێم و زەرداوی لەگەڵدایە . |
| غنغرينا الشيخوخة | Senile gangrene | گەنگرینای پیری ، لە دەست و قاچی مرۆڤی پیردا دەبێت . |
| غنغريني، مواتي | Gangrenous | گەنگرینی، شتێك پەیوەندی بە گەنگریناوە هەبێت . |
| غنغرينا الفم | Nomacancrum, Stomatitis, Gangreno-oris | گەنگرینای ناودەم. |
| غنغرينا الشرج الوبائية | Caribi | گەنگرینای درم لە کۆمدا. |

| | | |
|---|---|---|
| فجل أسود - فجل حار | Black radish | توری ڕەش- تورێکی کێویلەیە ڕەگەکەی ئەستوورو ڕەنگ بنەوشەییە دەرمانی لێ دەردەهێنرێت. |
| فجل برّي - فجيلة | Wild radish = white charlock = flix weed = wild mustard | خەرتەلە کێویلە- تورە کێویلە- گیایەکە لەناو دەغلوداندا دەڕوێت زیان بە ڕووەك دەگەیەنێت بەلاّم بۆ ئالیکی ئاژەڵ باشە، هەروەها دەرمانی لێ دەرئەهێنرێت. |
| فجل الجمال = سمارة - توذريج | Hedge mustard = erysimum | تۆودەری- توری ووشتر- گیایەکە گوڵەکەی زەرد و وردە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت بۆ چارەسەرکردنی دەنگ نووسان. |
| فجل الهند - فجل جاوا - مخري | Snackeradish mougri | توورە مارانە- جۆرە تورێکە ئەڕوێنرێت، سەلکەکەی مێخی ئەستوورە ئەخورێت، هەروەها بەرەکەشی ئەخورێت. |
| فجل الخيل = فجل الحصان = خردل الألمان | Horse radish | تووری ئەسپ، گیایەکی پزیشکی ڕەگەکەی ئەستور و سپییە گوڵەکەی سپی و بچووکە جۆرە ڕۆنێکی لێ دەرئەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| فجل ياباني = فجل لفتي = ديكون | Daikons | تووری جاپانی-(دیکۆن) جۆرێکە لە توور ئەخورێت گەلێك شێوەو قەبارە و ڕەنگی هەیە بە شێوەی بەهاراتیش بەکاردێت. |
| فجوة - حَيز | Copartment = lacuna = cavity | کەلێن- بۆشایی |
| فجوة - فرجة | Vacuole = gap | بۆشۆکە-کەلێن- بۆشایی- بەتاڵی- تورەکە بۆشاییەکی خڕە لە سایتۆپلازمی خانەی ڕووەك و گیانداردا بە پەردەیەك دەورە دراوە شلەیەك یان مادەیەکی ڕەقی تیادایە فرمانی هەرس کردنی یان هەڵگرتنی خواردەمەنی یان دەرهاویشتنی پاشماوە دەبینێت. |
| فجوة صخرية | Geode | جیۆت- کەلێنێك کە لە مرۆڤێکدا کەبەبلوور ناوپۆش بوبێت. |
| فجوة عصارية | Juice vacuole | بۆشۆکەی ناوگی |
| فجوة غذائية | Food vacuole = Digestive vacuole | کەلێنی خواردەمەنی- بۆشۆکەی خواردەمەنی |
| فجوة متقلصة | Contractile vacuole | کەلێنی کرژەوەبوو- بۆشۆکەی کرژۆك |
| فجوة هوائية | Air gap | کەلێنی هەوایی- بۆشاییەك پڕبێت لەهەوا |
| فجوة هوائية - جيب هوائي - مطب هوائي | Air pocket | گیرفانی هەوایی |
| فجوة زيتية | Oil vacuole | بۆشۆکەی چەوری- کەلێنی چەوری، وەکو لە خانەی هەندێك ڕووەکدا هەیە. |
| فجور - دعارة | Debauchery = dissipation lacunar = vacuolar | جووت گرتن بە حەرامی- داوێن پیسی- پیاوخراپی |
| فجوي | Lacunar = Vacuolar | بۆشۆکەی کەلێنی- شتێك پەیوەندی بە ( بۆشایی) کەلێنەوە هەبێت. |
| فجيلة | Wild radish = white charlock = flix weed = wild mustard | تورۆکە- خەرتەلە کێویلە- تورە کێویلە- گیایەکە لەناو دەغلوداندا دەڕوێت زیان بە ڕووەك دەگەیەنێت بەلاّم بۆ ئالیکی ئاژەڵ باشە، هەروەها دەرمانی لێ دەرئەهێنرێت. |
| فجيلة الشط - رشاد البحر | Searocket | تووری دەریا- تەرەتیزەی دەریا- گیایەکی دەشتەکی پزیشکییە گوڵەکەی سپی و بچووکە بۆ لەوەڕ باشە. |
| فُحّال - فحول | Spadix = date palm male | دارخورمای نێر |
| فحام | Coalmerchant = coaler | خەڵووز فرۆش |
| فحام - تفحم الرئة | Anthracosis | ڕەش بوونی سیەکان- تۆزاویی بوونی سیەکان بە دوکەڵ یان خاکە خەڵوز. |

| | | |
|---|---|---|
| فحج = حنف | Bow-legged = Bow-leg = strethenopodie = talipesvarus = club footed | قاچ خواری بە شێوەیەکی زگماکی= پەیزەنی= نزیك بونەوەی سەری پەنجە گـەورەی هـەردوو پـێ، وە دوورکەوتنـەوەی پاژنـەی هـەردوو پـێ لـە یەکتری‌یەوە. |
| فحش = فسْق | Adultery = lewdness | داوێن پیسی |
| فحش بالميت | Necrophilia | مردوو گاین |
| فحص | Test = examination = checking | فەحس= سەیرکردن- پشکنین= نۆڕین |
| فحص طبي | Medical examination | پشکنینی پزیشکی |
| فحص الجسم | Body checking | پشکنینی لەش- شەیرکردنی لەش بۆ مەبەستی پزیشکی |
| فحص الجيوب بالأشعة | Sinography | پشکنینی گیرفانەکانی لووت بە تیشك |
| فحص الجثة (او تشريحها) | Autopsy = necropsy | پشکنینی لاشەی مردوو= سەیرکردنی لاشە |
| فحص الأروما | Stump analysis | پێوانی قەف= پێوانی ئەلقەکانی بڕگەی پانی قـەدی درەخـت بـۆ زانینـی تەمەنی ئەو درەختە. |
| فحص الأسنان | Odontalysis | پشکنینی ددان= سەیرکردنی ددان |
| فحص الجمجمة | Cranioscopy | پشکنینی کەللەی سەر- سەیرکردنی کەللەی سەر |
| فحص الخلايا | Cytoscopy | پشکنینی خانەی لەش= سەیرکردنی خانەی لەش |
| فحص البيض | Candling of eggs | پشکنینی هێلکە= جیاکردنەوەی هێلکەی پیت کراو و ناپیت کراوبەوەی کەبدرێتە بەر چرایەکی تایبەتی |
| فحص (تحليل) الحبوب | Seed analysis | پشکنینی (شی‌کردنەوەی) دانەوێڵە- خەملاندنی ڕێژەی سەدی تۆوی پاك لـە نمونەیـەکدا هـەروەها ڕێـژەی سـەدی خڵتـە لـەتۆوی گژوگیـای هەمـە جۆرەدا. |
| فحص اللحوم | Meat inspection | پشکنینی گۆشت |
| فحـــص الذقـــن - نقرة الذقن | Pit, or, hollow, or, hohe of chin | چاڵی چەناگە |
| فحل = ذكر | Bull = Stallion | نێرە وس- کەڵ= نێر= نەڕ |
| فتاة مسترجلة - فحلة = إمراة مرجلانية - إمراة مسترجلة | Virago | نێرە کوڕانی- نێرە کورکانی= ئافرەتێك هەنێك ڕەوشتی پیاوی تیادابێت |
| فحل الكلب | Male dog | گەماڵ= نێرە سەگ |
| فحل الحمير = عير | Stud-ass | نێرەکەر |
| فحل الغنم - ذكر الغنم | Sheep (male) | بەران= نێرەی مەڕ= شەکە نێری= قۆچ- تگڵ |
| فحل المعز - فحل الماعز | Goat (male) | سابرێن= نێری تەگە= ئەژە= خرت |
| فحل البقر = ثور السفاد | Stud-bull | کەڵە گا |
| فحل الخيل = طلوقة | Stallion = entire | ئەسپی پەڕین |
| فحا ونثيا = ذكر وانثى | Tenon and- mortise | نێرومێ- زمانەو چاڵ= وەکوو ئەوەی سەری کە پارچە تەختەیەك بخرێتە درزی پارچە تەختەیەکی ترەوە بۆ قایم کردن. |
| فحل القبج - قاق | Red leg (male) | نێرە کەر |
| فحم | Coal = carbon | کاربۆن- خەڵووز- ڕەژی= ڕەژوو= زووخاڵ= ماددەیەکی کاربۆنی‌یە لە ئەنجامی شی‌بوونەوەی بەشی ماددە ڕووەکی‌یکان لە ناخی زەویدا پەیدا دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| فحم اسمر = فحم بني | Brown coal | خەلووزی قاوەیی |
| فحم نباتي | Char coal | خەلووزی ڕووەکی= خەلووزی لابردنی ڕەنگ، بریتی‌یە لە پاشماوەی دلۆپاندنی تەختەو لەشی گیاندار لە شوێنێکدا کە هەوای تیا نەبێت بۆ لابردنی ڕەنگی شلەی ڕووەك بەکار ئەهێنرێ |
| فحم حجري | Coal = pit-coal | خەلووزی بەردین |
| فحم حجري طري - فحم بيتوميني = فحم حمري | Bituminous-coal | خەلووزی بتیومینی- خەلووزی بەردینی قیری= خەلووزی بەردینی تەڕ- خەلووزێکی فشەڵە نزیکەی نیوەی بریتی‌یە لە کاربۆن. |
| فحم الكوك | Coke | خەلووزی کۆك- مادەیەکی ڕەش کونیلە دارە لە ئاتەواو سووتانی خەلووزی بەردین لە کورەدا پەیدا دەبێت. |
| فحم الأنثراسيت | Anthracite-coal | خەلووزی ئەنتراسیت، جۆرێکە لە خەلووزی بەردین زۆربەی کاربۆنە. |
| فحم اسمر - فحم اللفنايت | Lignites = Brown coal | خەلووزی قاوەیی، =خەلووزی لیگنایت- جۆرێکە لە خەلوزی بەردین نزیکەی نیوەی کاربۆنە ڕەنگەکەی قاوەیی‌یە |
| فحمة الساق = تفحم الساق | Black leg | خەلووزە- نەخۆشی‌یەکی ڕووەکی‌یە لە بەکتریاوە دادەکەوێت و دەبێتە هۆی ڕەش بوونی قەدی ڕووەکەکە وەکوو لە توتن و کەلەرم و گێزەرو پەتاتەدا. |
| فحم المعوجات | Retort carbon | خەلووزی چەوتەك= ئەو خەلووزەی کەلەسەر دیوی ناوەوەی دیواری چەوتەکی دەزگای دلۆپاندنی خەلووزی تەڕ دەنیشێت. |
| فحم ماص | Sucker coal | خەلووزی مژۆك= جۆرە خەلووزێکە ڕەنگ یان گاز هەڵ ئەمژێت بۆ لابردنی ڕەنگ لەکەرەستەی خواردەمەنی بەکاردێت. |
| فحم العظام | Bone charcoal = bone-black | خەلووزی ئێسقان- خەلووزی ئێسك |
| فحم حيواني | Animal char-coal | خەلووزی گیانەوەر- لە دلۆپاندنی فەوتێنەری خوێن و ئێسك دروست دەبێت. |
| فحم الخشب | Char coal | خەلووزی دار |
| فحمي (عصر) | Carboni ferous-period | خەلوزیی- کاربۆنی (پەیوەندی هەیە بەسەدەی جیۆلۆجی‌یەوە) |
| فحمي - اسود | Black = Jet black | ڕەش- خەلووزی |
| فحم منشّط = فحم فعّال | Activated-char coal | خەلووزی چالاك- خەلووزی چالاك کراو= ئەو خەلووزەی کە وای لێدەکرێت بتوانێت مادەی تر هەڵمژێت. |
| فحومة = شقران = اسود = انتراكنوز | Anthracnose smut = stemrust | نەخۆشی‌یەکی ڕووەکی‌یە لەداری مێو دەدات. |
| فحيح | Spreading of-perfume | بۆن بلاوبوونەوە |
| فحيم = شديد السواد = فاحم | Jet-black | زۆر ڕەش |
| فحيح الأفعى | Hissing | فیشکەی مار- دەنگی مار |
| فحيل = مُنجب | Thorough bred-stud | نێرەی گیانداری (ولاخ) ڕەسەن |
| فَخ = مصيدة | Trap = snare | تەڵە- داو- خەفك= تەپکە |
| فَخّار - فخاريات | Crockery = earthen ware = pottery | گڵێنە- گڵ- دیزەو گۆزە |
| فخار مزجج = خزف = سيراميك | Glazed pottery = ceramic | گڵێنەی شوشێنراو= فەخفوری- سیرامیك |
| فخار مصقول | Burnished pottery = burnished ware | فەخفوری ساف کراو |

| | | |
|---|---|---|
| فَخْت | Moon light | مانگه شەو = تریفەی مانگ- ڕووناکی مانگ |
| فخج = شلل النصف السفلي من الجسم | Paralegia | ئیفلیجی نیوەی خوارووی لەش |
| فخذ | Thigh = Femur | ران، بەشێك لە قاچ |
| فخذة لحم | Leg (mutton) | ڕانە گۆشت- گۆشتی ڕان |
| فخذة لحم الخنزير | Ham | ڕانی بەراز |
| فخذة لحم الطير | Leg (of fowl) | ڕانی باڵندە |
| فخذة لحم البقر | Rump (of beef) | ڕانی مانگا |
| فخذي | Femoral | ڕانی شتێك پەیوەندی هەبێت بە ڕانەوە. |
| فَخْر | Glory = honour | شانازی- سەر بڵندی |
| فخر الثلوج | Chionodoxa | شانازیی بەفر- ڕووەکێکە گوڵدارە لە کۆمەڵەی زەمەق لەشوێنی بەفراویدا دەڕوێت. |
| فخري | Honorary | شانازیانە |
| فَخْفَخَة | Ostentation = Highpretension | کەشخە- خۆش گوزەرانی= تڕزل |
| فخفخة | Brady- Spermatism | بەهێواشی ئاوهاتنەوە |
| فخم = عظيم | Magnificent = loxurious = Grand = Sumptuous | مەزن |
| فدّان = اكر | Feddan = Egyptian acre = Acre of land | ئەکر- فەدان- پێوەرێکە بۆ ڕووبەر- ٠,٤ هکتار- بە پارچە زەوییەك کەبەرزێك جووت بکرێت- زەوییەکە کە ڕووبەرەکەی چوار هەزارو چل و هەشت یان چوار هەزارو دووسەد مەتر چوار گۆشە بێت |
| فدّان = بَقَرْ | Yok (of oxen) | گاجووت |
| فدام = مصفاة | Filter | پاڵوێنە= سوزگی |
| فدام القارورة | Bottle cap | سەرقاپی توتڵ= دەمەوانەی بوتڵ |
| فدام | Comedo | زیپکەی ڕەش لە دەموچاودا |
| فدار = احتياطي = فائض = زائد | Spare | سوپێر- سپێر |
| فُداد = فُدادة أنواع البوم :- فُداد = حنم = خبل = صدي = ضوع = فهام = هرفغ = هوذ | Barn- owls Screech-owls | جۆرێکە لە کوندە بەبوو گەورەیە سەری زلەو ڕەنگی قاوەییە، دەورو خوڵ عەماری گەنم دەدات |
| فَدادة | | راجع (ضفدع) |
| فَداء = شونة = هري = انبار | Loft | (سایلۆ) کەنوو- عەمار- عەماری دەغڵودان. |
| فدخ الرأس = هَرْس الرأس | Cephalotripsy | لەت کردنی کەللەی سەری کۆرپەلە. |
| فَدَر | Chamois | راجع (شمواة) |
| فُدس | | راجع (عنكبوت) |
| فُدش | Spider (female) | جاڵجاڵۆکەی مێ |
| فَدَع = عوج المفاصل | Deformative-arthritis = Talippes varus | مەچەك خواریی= قاچ خواریی بۆ دیوی ناوەوە- خوارو گێڕی لە دەست و قاچدا. |
| فدغ الجمجمة = ثقب الجمجمة | Craniotomy | لەت کردنی کەللەی سەر- بڕینی کەللەی سەر- کون کردنی کەللەی سەر. |
| فدم = أبله | Idiot | حۆل- کەودەن- گەمژە، گێل |
| فدومة = بلاهة | Idiocy = idiotism | حۆلی- کەودەمی- گەمژەیی، گێلی |

| | | |
|---|---|---|
| فدية | Ransom | بژاردن- پاره بژاردن= خوێن بژاردن |
| فذّ - فرد | Unique = single | تاك |
| فذلكة - خلاصة | Summing up = summary | پوختەی ژماردنی پارە یان کڕین و فرۆشتن. |
| فرامة = قطاعة | Mincer | ئامرازی جنین. وەکوو جنینی سەوزەوات. |
| فرامة = خرقة الحيض = رفادة الحيض - ضمادة الحيض | Menopad | پەڕۆی بێنوێژی= سارغی بێنوێژی |
| فرامة اللحم | Mincer = Meat chopper | مەکینەی گۆشت= مەکینەی گۆشت جنین |
| فراميجين | Framygen | (فراميجين) جۆرێکە لە قەترەو مەڵحەمی چاو |
| فرّار - زئبق | Quicksilver | جیوە- کانزایەکی شلە ڕەنگی زیویيە |
| فرار - هروب | Flight = bolt | هەڵاتن= ڕاکردن |
| فرادة | | راجع (عاتقة) |
| فرارة - فريرة = قرص دوام | Teetotum = Disctop | فرفرۆکە= مزراح |
| فرات | Fresh water | ئاوی شیرین |
| فرّان | Oven bird | باڵندەی تەنور= تەنورەوان- باڵندەیەکە هێلانەکەی لە شێوەی گومەز یان تەنوردا دروست دەکات. |
| فراخ - دجاج | Hens = Fowls | مریشك |
| فراز = جهاز القوة العمركزية | Centrifugal-seperator | دەزگای دەرپەڕاندنی چەقی، لە دروست کردنی شەکدا بەکاردێت. |
| فرّاء | Furrier | کەوڵ فرۆشتن، فەروە فرۆش، ئەو کەسەی کە جل و بەرگی فەروە دروست دەکات. |
| فراءة | Furriery | پیشەسازی فەروە دروستکردن |
| فَراش | Servant = waiter | بەردەست- دەرگاوان= ئیشکەر= نوێن ڕاخەر |
| فِراش - منام - حشية | Bed = Mattress | نوێن- پێخەف- سیپاڵ |
| فراش السرج | Saddle cloth = saddle mattress | سەرزین |
| فراش البرذعة | Pack-saddle-cloth | سەرپاڵان |
| فراش صغير | Lectulum | نوێنێکی بچووك |
| فراش القشّ | Litter | نوێنێك لە کاو پووش بۆ پاڵکەوتنی ئاژەڵ لەسەری |
| فراسكين - ليمون هندي | Pomelo tree = sckad dock-tree = pampel moose = pompelmous | پۆمیلۆ- شادۆك- لیمۆی هیندی- درەختێکی گەورەیە گوڵەکەی گەورە و سپیو بۆن خۆشە بەرەکەی خڕە، ئەم سەرو ئەو سەرەکەی قوپاوە، ڕەنگەکەی سەوزێکی کاڵە ئاوەکەی مەیلەوتاڵە، بەشەکرەوە دەخورێت. |
| فراغ - خلو | Emptiness = vacoom = vacuity = space | بۆشایی- ڤالا= ڤالبوون |
| فراغ تورشيلي | Torricellian-vaccum | بۆشایی تۆرشەلی- کەلێنکە هەوای تیادا نیە،دەکەوێتە سەرەوەی جیوە کەلە بارومەتردا |
| فراغ جنبي | Pleural-cavity | بۆشایی کەلەکە= بۆشایی تەنیشتەکانی بەینی سیو پەراسوو. |
| فراغ فمي | Oral cavity | بۆشایی (ئاودەم) |

| | | |
|---|---|---|
| فراداي | Faraday | (فارادای) برێکه له کارەبا دەکاته (٩٦٥٠٠) کۆلۆم،یان ئەو بڕی کارەبایەی کە،بەش کردنەوەی کارەبایی،کێشێکی هاوهێز لە ئایۆنی مادە جیا دەکاتەوە |
| فرانكولين - دبلسم - حبقط = حبقطان = دراج | Francolin | پۆڕ- باڵندەیەکی جوانی سرکە ڕەنگەکەی قاوەییە لە چەمووچخوردا دەژی گۆشتەکەی خۆشە. لەبەر ئەوە زۆرە ڕاودەکرێت. |
| فرانسيوم | Francium | (فرانسیۆم) توخمێکی کیمیاگەرییە تیشکدەرەوەیە نیشانەکەی (Fr) ژمارەی ئەتۆمیەکەی(٨٧) دەست کردە ناوەکەی لە ناوی (فەرەنسە) وەرگیراوە.هاوهێزییەکەی (+١) قورسترین توخمە لە کۆمەڵەی کانزا ئەلکالییەکاندا. |
| فرازة = مفرزة | Separator | ئامرازی جیاکردنەوە، وەکو جیاکردنەوەی قەیماغ لەشیر یان کەرە لە دۆ. |
| فرّاز الحبوب | Seed sorter | ئامرازی جیاکردنەوەی دانەوێڵە. |
| فرازة الحليب = فرازة القشدة | Cream seperator = centrifugal separator = creamer | ئامرازی جیاکەرەوەی شیر= ئامرازی جیاکەرەوەی قەیماغ. |
| فراسيون - مروبة | Horehound = hoarhound = Marrubium | پونگە- گیایەکی دەشتەکی پزیشکی بۆن خۆشە، گوڵەکەی بچووکە. |
| فراسيون ابيض = حشيشة الكلب = فلية | White hore-hound | پونگەی سپی= گوڵەکەی سپییە |
| فراسيو القلب - بقلة الأمهات | Mother wort | جۆرێکە لە پونگە گوڵەکەی سوورە. |
| فراسيون الماء = حشيشة الغجر | Waterhoar-hound = Gipsy-herd = Bitter bugle wort | پونگە ئاوی= گیا قەرەج |
| فراسيون اسود = بلوط الأرض = سنديان الأرض | Black hore- hound = Black-hemp Nettle | ڕەیحانە کێویلە- بەرووی زەوی، ڕووەکێکە بۆ بەهێز کردنی گەدەو ڕەوان کردن بەکاردەهێنرێت. |
| فَرّاء - قولان - فَرّا التبت = حمار كيانج | Kiangass | کەری کیانگ، جۆرێکە لەکەرە کێوی، قەڵەوو بەهێزە لە ئاسیادا دەژی بەتایبەتی لە وڵاتی تیبتدا. |
| فرارجي - دجاجي - بائع الدجاج | Poulterer | مریشک فرۆش |
| فراسة - علم الفراسة | Physiognomy | زانیاری سەروسیما= تێبینی کردن و خوێندنی سەرو سیمای کەسێک لەسەر بنچینەی ئەوەی کەپەیوەندی هەیە بەڕەوشت و دەروونەوە. |
| فراسة الجوّ - تنبؤ جوي | Weather cast | نوقلانەی کەش= نوقلانە لێدان دەربارەی دیاردەکانی کەشوەکوو دەربارەی سەرماو گەرماو ڕەشەباو باران ..هتد |
| فراسة اليد - قراءة الكف | Chiromancy = Palmistry | دەست گرتنەوە- دەست خوێندنەوە |
| فراسة الدماغ | Phrenology | زانیاری شێوەی کەللەی سەر- خوێندنی شێوەی کەللەی سەر لەسەر ئەو بنچینەیەی کە پەیوەندی هەیە بەشەخسیەت و بەهرەمەندییەوە. |
| فراش المرض | Sick-bed | نوێنی نەخۆشی= جێگەی نەخۆشی |
| فراش الموت | Death bed | نوێنی مردن |
| فراش الدواب | Litter | نوێنی ئاژەڵ- ئەو پووش و پەڵاشەی کە لە تەویلەدا ڕادەخرێت بۆ ئەوەی کە ئاژەڵی لەسەر بخەوێت. |

| | | |
|---|---|---|
| فراك | Frock coat | چاكەتێكی پیاوانەی كورتی ڕەشە هەتا سەر ئەژنۆ دێت. |
| فرادا - فُرادي | One by one = Singly | یەك لە دوای یەك |
| فراشة = ابو دقيق - عثة = فراش | Moth = butterfly | پەپولە- بەلاتینك- پەروانە- باویلكە= مۆرانە |
| فراش الليل - ليلية | Nocctuid = nocturnal moth | پەپولەی شەوەكی |
| فراشة زرقاء | Blue bottle | مژمژە- جۆرە پەپولەیەكی شینكارە، دەمی دەكات بە ناو كرۆكی گوڵدا و دەیمژێت. |
| فراشة الحصيد | Turnip dartmoth | مۆرانەی شێلم |
| فراشة الحنطة | White line- dartmoth | مۆرانەی گەنم |
| فراشة النبات | Plant moth | پەپولەی ڕووەك- مۆرانەی ڕووەك= كرمی ڕووەك= مێروویەكە زیان بە ڕووەك دەبەخشێت. |
| فراشةالتفاح | Apple fruit- miner = Apple ermine moth | مۆرانەی سێو- كرمی سێو |
| فراشة الدقيق | Flour moth = meal moth | مۆرانەی ئارد |
| فراشة الكراث | Leek moth | مۆرانەی كەوەر |
| فراشة الليلك | Lilac moth | مۆرانەی درەختی لەیلاق |
| فراشة الزيتون | Olive moth | مۆرانەی زەیتون |
| فراشة الكمثري | Pear moth | مۆرانەی هەرمێ |
| فراشة البطاطس | Potato moth | مۆرانەی پەتاتە |
| فراشة قارضة - دودة قارضة | Greasy- cutworm | پەپولەی قرتێنەر- كرمی قرتێنەر- مۆرانەی قرتێنەر- جۆرێكە لە مێروو ڕووەك دەقرتێنێت و دەیخوات وەكو مۆرانەی لۆكە. |
| فراشة الأرز | Rice moth | مۆرانەی برنج |
| فراشة الباذنجان - حفار ساق الباذنجان | Eggplent- sten- borer | مۆرانەی باینجان |
| فراش القشّ | Litter | نوێنێك لە كاو پووش بۆ پاڵ كەوتنی ئاژەڵ لەسەری. |
| فراشة البلح | Palm moth | مۆرانەی خورما |
| فراشة البلوط | Oak moth | مۆرانەی بەڕوو |
| فراشة الحبوب | Grain moth | مۆرانەی دانەوێڵە |
| فراشة بيضاء | White butterfly | پەپولەی سپی- مۆرانەی سپی- پەپولەیەكی گەورەیە لەسەر گەڵای سەوزە دەژی وەكو شێلم و كەلەرم. |
| فراشة الحور | Viceroy | مۆرانەی چنار- پەپولەیەكی ڕەنگینە بە ڕەنگی پرتەقاڵی و سوور و ڕەش و سپی زیان بە درەخت و چنار و بی دەگەیەنێت. |
| فراشة الزبيب | Raisin moth | مۆرانەی مێووژ |
| فراشة الشوك | Thistle butterfly | مۆرانەی كەرتەش |
| فراشة العنب | Grape moth | مۆرانەی ترێ |
| فراشة الكرم | Tortrix vitana | مۆرانەی داری مێوو |
| فراشة الكرنب | Cabbage- butterfly | مۆرانەی كەلەرم |

| | | |
|---|---|---|
| فراش النهار | Rhopa locera | مۆرانەی رۆژەکی= پەپولەی ڕۆژەکی |
| فراشــة - كرنبيــة = دودة النبات | Black- veined- white = Garden- white | پەپولـەی زیـان بـەخش بـە ڕووەك- کرمـی زیـان بـەخش بـە ڕووەك وەکـو ڕووەکی گۆیژ و کەلەرم و شێلم. |
| فراشيات - فصيلة الفراشيات | Papilonidae | پەپولەیی‌یەکان- پەل (خێزانی) پەپولەکان. |
| فرانسيوم = فرنسيوم | Francium | توخمێکی کانزاییی‌یی نیشانەکەی (Fr) ە ژمارەی ئەتۆمیی‌یەکەی (٨٧)ە و کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (٢٢٣) یە هاوهێزی‌یەکەی(+١)ە بە شێوەی هاوتایی (نظير) تیشکدەرەوە هەیە. قورسترین کۆمەڵەی کانزائەڵکانیەکانە، جاران پیێ دەوترا(ئەلابامین) |
| فرانكلينيت | Franklinite | (فرانکلینیت) یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی توتیا، بریتیە لە ئۆکسیدی ئاشن و توتیاو مەنگەنیز ڕەنگەکەی ڕەشەو بە شێوەی بلووری خشتەکی هەیە ڕەنگەکەی قاوەیی مەیلەو ڕەشە لە ناوچەی نیو جەرسی لە ئەمەریکادا هەیە. |
| فرانسيفيليت | Francevillite | (فرانسیڤیلیت) کەرەسەیکی خاوە باریۆم و قورقوشم و یۆرانیۆم و ڤانادیۆم و هایدرۆجین و ئۆکسجین تیادایە ڕەنگەکەی زەردە. |
| فرانكلن | Franklin | (فرانکلین) یەکەی کارەبایی لێخشاندن |
| فراكسنوس | Fraxinus | (فراکسینۆن)- درەختێکە لە کۆمەڵەی زەیتون. |
| فرامبواز - فرمبوزة - عوسج إيده | Redraspberry = raspberry = bush | جۆرێکە لە تووترك، گوڵەکەی سپی‌یەو بەرەکەی بنەوشەیی تێرە، خۆشە، ئەخورێت. |
| فرامبيزيا | Frambesia | (فرامبیزیا) نەخۆشیەکی پێستە زیپکەکەی لە تور دەچێت. |
| فرانق - ببر | Tiger | بەور= جۆرێکە لە پڵنگ لەشەکەی هێڵدارە |
| فرانق - عناق الأرض | Lynx = caracal | سیاگوش= سیولۆ جۆرێکە لە پشیلە کێوی سەری گوێچکەی تۆپەڵە مووی پێوەیە. |
| فراولة - شليك - شيلك | Strawberry | شلێك= چلێك= چیلەك= ڕووەکێکی گیایی تەمەن درێژە، هەندێك لە قەدەکانی دەخشێن بەسەر زەوی‌دا، گەڵاکەی سێ پەلکە بەرەکەی سوورە لە توو دەچێت بەڵام گەورەترە تامێکی ترش و شیرینی خۆشی هەیە. |
| فرانكينيا | Frankenia | (فرانکینیا) گیایەکە چەند جۆرێکی هەیە هەندێکی وەکو چایی بەکاردێت. |
| فرارية | Tiger flower | جۆرێکە لە سوێسنە (سوسن) گوڵەکەی گەورەیە سوری مەیلەو بنەوشەیی یان سەوزی مەیلەو قاوەیی‌یە ماددەیەکی زەمقی پزیشکی لێ دەردەهێنرێت. |
| فراية = فريّ | | راجع ( سمانى) |
| فربام = فرميت | Ferbam | (فێربام) تۆزێکی ڕەشە بۆ لەناوبردنی نەخۆشی ڕووەك بەکارئەهێنرێت. |
| فربيون - يتوع = تاكوت - عنجد | Euphorbia = spurge wort grass = milk wort | شیرمار- خوژیلك= خوشیلك= ڕووەکێکە گەلێك جۆری هەیە گەڵاکەی ئەستوورە، قەد و گەڵاکەی شیراوێکی ژەهری ترسناکی تیایە، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| فربيون الأقدمين = يتوع هندي - زقوم هندي | Ancient milk wort | شیرماری هیندی |
| فربيون الفجر = يتوع السحور = رمادة | Sun spurge = wort grass = wort- wort | شیرماری بەرەبەیان- جۆرێکە لە ڕووەکی شیرمار. |
| فربيون المكسيك | Mexican fireplant | شیرماری مەکسیك |

| | | |
|---|---|---|
| فربيون متصالب - حبّ الملوك | Caper spurge = Myrtle spurge = wild caper | شيرماری مۆرد |
| فربينا = مينا - رعي الحمام | Verbena = ver vain | مينا- (ڤێربينا) گيايەكە گوڵی ئاوێتەی وورد و جوان دەگرێت بە ڕەنگی شين يان مۆر. |
| فرتكة | Particle | ١-تەنۆكە(جسيمة)<br>٢-ئامراز<br>٣-پارچە نان(برشانة) |
| فرتيكة - شوكة | Fork | چەتاڵی نان- چەنگاڵی نان |
| فرتودر | Fertodur | (ڤێرتۆدەر) دەرمانێكە بۆ چارەكردنی وەجاخ كوێری لە جۆری فرمانی، بۆ ئافرەت بەكاردێت. |
| فرتابول | Fertabol | (ڤێرتابۆل) دەرمانێكە بۆ چارەكردنی لاوازی گشتی لە لەشدا بۆ نمونە چارەكردنی بێ هێزی و خوێن كەمی. |
| فرتيت - العرق المديني - الشعرة الحية | Guinea worm = Filaria medinenis | كرمی غينيا- كرمێكە مێيەكەی مشە خۆرە لە ژێر} پێستی مرۆڤدا دەژی، كە گەورە دەبێت درێژییەكەی نزيكەی شەش پێ دەبێت. |
| فرتانيون - اقحوان | Feverfew | بەيبون= گيايەكە گوڵی زەرد و سپی دەگرێت بۆ مەبەستی پزيشكی بەكاردێت. |
| فَرْث | Feces | ريخ- شياكە= خواردەمەنی لە ناو وورگی گياندارا |
| فرج الأنثى = حياء | Pudendum vulva = cunnus vagina | كوز- قوز- زەها- زێ، بەشی دەرەوەی كۆئەندامی زاوزێ لە گياندارى مێدا. |
| فرجي | Vulvar | قوزيی= كوزيی- شتێك پەيوەندی بە قوزەوە هەبێت. |
| فرجي الشكل | Vulvi form | كوزی= قوزی- شتێك لە شێوەی قوزدا بێت واتا شێوەيەكی هێلكەيی هەبێت و درزێكی لە ناوەڕاستدا بێت و ئەم لاو ئەولاكەی بەرز بێت. |
| فرج الأرض | | راجع سورنجان الجبل |
| فرجون(فرشاة) العين | Eye brush | فڵچەی چاو- ئەندامێكە لە تەنيشت چاوی زۆبيانەوە هەيە بۆ پاك كردنەوەی لە پيسی بەكاری دەهێنێت. |
| فرجون - فرشاة | Brush | فڵچە- فڵچەی جل |
| فرجون - محّة | Curry comb | ڕنەك= فڵچەيەكی ئاسنە بۆ پاك كردنەوەی پێستی وولاخ. |
| فرجنة | Grooming | پاك كردنەوەی پێستی وولاخ لە پيسی و تەپ و تۆز. |
| فرجال الثخن - قدمة | Caliper | (كاليپەر)- پرگاڵی پێوانی ئەستوری |
| فرجال - فِرْجار - برجل | Compass | پەرگاڵ- پرگاڵ- جەدوەر |
| فرجال الفقي | Beam- comp- asses | پرگاڵی ئاسۆيی= بۆ وێنە كێشانی بازنەی گەورە بەكاردەهێنرێت. |
| فرجاطة - فرقاطة | Frigate | كەشتی جەنگی= پاپۆری جەنگی |
| فرجة - فتحة | Operture = Gap = lacuna = Interstice = Spacing = Chint = Hiatus | كەلێن= دەلاقە= كون |
| فرجة الشرارة | Spark- gap | كەلێنی پريشك: ماوەی نێوانی دوو ئەليكترۆدكە بەتاڵ كردنەوەی كارەباييان تيادا ڕوو دەدات كاتێك كە جياوازی ئەرك لە نێوانياندا دەگاتە برێكی تايبەتی. |
| فرجة | Gap | دەربەند= كەلێنێك يان دۆڵێك لە نێوانی دوو چيادا. |

| | | |
|---|---|---|
| فرجة الأشتعال = فالية البندقية | Touch hole | كونى تيز= كونى تفەنگ كە بارووتەكەى لێوە دەسووتێنرێت. |
| فرجية | Faragia | پۆشاكێكى فراوانى قۆڵ درێژە پياوانى ئاينى لەبەرى دەكەن. |
| فرجيت | Virgate | (ڤيرجيت) پێوەرێكى ئينگليزى كۆنە بۆ پێوانى رووبەر بەكاردەهێنرا. |
| فرجينيوم، فرانسيوم | Virginium | (ڤيرجينيۆم) توخمێكى كانزايى دەگمەنە. |
| فرح | Gladness = Happiness | خۆشى- شادى |
| فرحان | Glad = Hapy | دڵخۆش- دڵشاد- شاد |
| فرط = نفض | Beating = nimiety | تەكاندن- وەراندن، وەكو وەراندنى بەرى درەختى گوێز و توو و زەيتون. |
| فرطوسة - فرطيسة - فنطيسة | | لمۆز- وەكو لمۆزى وولاخ |
| فِرط - رخيص | Cheap = low- priced | هەرزان |
| فرخ (حيواني) | Young | بەچكە- بێچوو- تێشك- چێليك |
| فرخ الأرنب | Rabbit (young) | خرناكە |
| فرخ أبو قردان | Heron shaw | بەچكەى شينە شاهۆ |
| فرخ الشاهين | Hobby | بەچكەى شاهۆ |
| فرخ العقاب | Eaglet | بەچكەى داڵ |
| فرخ الجاموس | Young buffalo | پەڵخە گامێش- پالاخ- ساك |
| فرخ الحمار | Young-ass | جاش- جاشك- جاشوولكە |
| فرخ - قاروس - ذئب البحر | Bass = perch | (باس)- گورگى دەريا- ماسىيەكى رووبارىيە |
| فرخ - لاطس - لاتس - حمار البحر | Lates | (لاتێس)- جۆرە ماسيەكە |
| فرخ نهري - قِشر | Perch | پێرچ جۆرە ماسيەكى رووبارى سەوزى ئاڵتونىيە |
| فرخ السمك | Alevin | بەچكە ماسى |
| فرخ الدجاج = كتكوت | Chick = Pcult | بارۆكە- ڤارك- زيفان- جووجك |
| فرخ القبج | Young partridge | گوار- بێچوى كەو كە باڵە فڕە نەبووبێ |
| فرخ القرد | Young ape | قەشمەر- بێچووى مەيمون |
| فرخ ورق - طلحة | Sheet of paper | تەبەقە كاغەز |
| فرخ السودان - غرغر - دجاج السودان | Guinea fowls | چين و ماچين- مريشكى حەبەشە- جۆرە مريشكێكى كونجە. |
| فرخ الديك الرومي | Poult | بەچكەى قەلەمون. |
| فرخ الغيط - فرفر = دجاجة المستنقعات - سحنون | Gallinule = Porphyrio | مريشكى كێڵگە، مريشكى زەلكاو- باڵندەيەكى ئاوييە. |
| فرخ الطير | Chicken = Poult = Chick = Brood | زەرنەقوتە- باڕۆكە- جووجك- جووجە- فرووج- جووجەڵە. |
| فرخ فجخ | | باڵەفڕە- پەرەوازە |
| فرخ النبات = شطء - ركزة = فسيل = رئد،طنب - مروش | Germination = Sapling = Tiller = Sucker = Clump- (of shoots) = sprout | چەكەرە، خەلف- براڵە، ئەو لقە گۆيكەدارەى كە لە بنكى يان لەسەر قەدى درەخت پەيدا دەبێت و سوودى لێ وەردەگيرێت بۆ زيادكردنى رووەكەكە. |
| فرخ السلمون | Samlet = Salmonet = Smolt = Grisle = Smolt = Parr = Peal | بەچكەى ماسى سەلەمون |
| فرخ مخصي = ديك مخصي | Capon = Poulard | كەڵەشێرێكى خەسێنراو بۆ مەبەستى بەهر برين (خواردن) قەڵەو دەكرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| فرخ الجمرة | Anthrax = Carb-uncle | نەخۆشـیەکی درمـە تووشـی مـەڕو مـالات دەبێـت لەوانەیـە تووشـی ئادەمیزادیش ببێت، بلقێکی پیسی لە دەم وچاو یان قوڵ دا پەیدا دەکات. |
| فرخ البط | Duckling = Young duck = small duck | بەچکە مراوی |
| فرخ الوزّ | Gosling | بەچکە قاز |
| فرخ الخنزير - خنوص | Socking pig | شیگە- بەچکە بەراز- بزلە- چۆغە بازمڵە- بێچوی بەراز- پەڵخە بەراز. |
| فرخة سلطانية - ديك سلطاني - فرفر | Porphyrio | کەڵەشیچری سوڵتانی= باڵندەیەکی لاق درێژە لە زۆنگاودا دەژی و ماڵی دەکرێت. |
| فرخ الدب | Young bear | بێوڵە- بەچکە ورچ |
| فرخ الذئب | Young wolf | پارکۆڵە- بەچکە گورگ |
| فرخ النحل - فِرق النحل | Bee-swarm | پلوورەی هەنگ- پوورەی هەنگ ئەو کۆمەڵە هەنگەی کە شانە کۆنەکەی بە جێ دەهێڵێت بۆ ئەوەی شانەیەکی تازە دروست بکات. |
| فرد - شخص | Individual = Unpaired | کەسـێک- سـەڵتە زەلام- زەلام- کـەس- هـەر زیندەوەرێـك بوونێکـی سەربەخۆی هەبێت و شێوە و سیفەتی تایبەتی خۆی هەبێت. |
| فردي | Sporadic | تاکی- یەکی |
| فرد - مسدس (سلاح ناري) | Pistol | دەمانچە |
| فرد بساقية | Rebolver | دەمانچەی شەستیر |
| فرد (للأشياء) | One = Single | تاك- یەك- تا- دانە- قل |
| فرد (للأحياء) | Individual | یەك کەس- یەك زیندەوەر |
| فرد بمشط | Automatic-pistol | دەمانچەی ئۆتۆماتیك |
| فردة - ضريبة الأعناق | Capitation- tax | سەرانە- باجی مەڕومالات |
| فردة | On of pair = Mate = Fellow | لنگ- تاك- تا- یەکێك لە جووتێك- فەردە. |
| فردية الكروموسومات | Haploidy | تاك کرۆمۆسۆمیەکان- ئەو گیاندار و ڕووەکانەی کە تەنها نیو کۆمەڵچەی کرۆمۆسۆمیان تیادایە وەکو نێرەی هەنگ. |
| فردية الأصابع - وترية الأصابع | Perissodactyla | تاك پەنجەکان- کۆمەڵێکە لە گیاندارە شیردەرەکان نینۆك دارن وەکو تاپیر و کەرکەدەن. |
| فردية - شخصية | Individuality | کەسێتی= کەسایەتی- ئەو سیفەتانەی کەسێك لەوانی تر جیا بکاتەوە. |
| فردوس - بستان | Garden | باخچە |
| فردوس | Tauri | بەهەشت- کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| فردوس - بستان الكرم | Vineyard | ڕەز- باخچەی مێو= باخچەی ترێ |
| فردوسيات | Birds of paradise | باڵندەکانی بەهەشت- کۆمەڵە باڵندەیەکی جوان و پەڕ درێژن. |
| فردي = غير مزدوج | Azygus = Individual | تاکی- ناجووت، تاکە کەسێك. |
| فردوس - جنة | Paradise | بەهەشت |
| فردوسي | Paradisac | بەهەشتی |
| فَرْز - فصل | Separation = Isolation | جیاکردنەوە |
| فَرْزين - مفرزين | Secretin | (سێکریدین)- هۆرمۆنێکی ڕیخۆڵەیییە هانی جگەر و پەنکریاس دەدات بۆ دەردان. |
| فرز - ثلة | Flock of sheep | مەڕگەل |

| | | |
|---|---|---|
| فرزان الشطرنج - ملكة الشطرنج | Queen | شاژنی شەترەنج |
| فرز الكثاة(القشدة) | Sreaming skimming | جیاکردنەوەی قەیماغ لە شیر |
| فرزدقة - خبزة غليظة | Thick bread | نانی ئەستوور- پەنجە کێشی |
| فرزجة | Pessary = Pessum | شاف (شافی هەڵگرتن) بە تایبەتی دژی سك پڕبوون. |
| فرْزِل = زردية لقطع الحديد | Pliers (for cutting iron) | پلایسی ئاسن بڕین- پلایسی ئاسن لەت کردن. |
| فرزع - حب القطن | Cottonseed | تۆوی لۆکە- دەنکی لۆکە- پەموانە |
| فرس(للذكر والأنثى) | Horse = Equs | ئەسپ و ماین ئەگرێتەوە.جۆرەکانی کەحێلە، سەگلاوی، عوبەیدە |
| فرس - حجْر - فرسة - انثى الخيل | Broodmare = Mare | ماین، مێیەی ئەسپ |
| فرس اصيل - فرس السباق | Blood- horse = Thoroughbred | ئەسپی ڕەسەن- ئەسپە کەحیلە- ئەسپی غارغارێن. |
| فـرس النـبي - سـرعوفة - ابو صلاح - حصان إبليس | Preying-mantid = Mantis = Praying insect | بالبالوکە- مەشکە درە- ئەسپی پێغەمبەر- کولـە حـاجی- مێروویەکـە باڵـەکی ڕاسـتە ڕەنگەکـەی سـەوز خـۆی لەسـەر ڕووەك مـت دەکـات بـۆ ڕاوکردنی مێروو. |
| فرس الشيطان = طير الكاتب - ابو حبيب | Secretary bird | باڵندەی نووسەر- باڵندەیەکە لە داڵ دەچێت مار دەخوات. |
| فـرس المـاء - برنيــق - بهيموت - سـيد قشـطة - فرس النهر | Hippopotamus = River horse | ئەسپی ئاوی- ماینی ئاوی- ماینی ڕووبار، گیاندارێکی شیردەری سم داری کەتەیە لە کەرکەدەن دەچێت سەری ئەستوور و گەورەیە مل و پەل و کلکی کورتن لە ناوی ڕووبارەکانی ئەفەریقادا دەژین گیا خۆرە. |
| فرس النهر القزم | Dwarf hippopo tamus | ئەسپی ئاوی گرگن. |
| فرس اصغر فل | Equaleus | ئەسپی بچووك- کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| فرس أعظم - فرس ثانٍ فل | Pegasus = Flying hourse | ئەسپی مەزن- ئەسپی فڕندە- کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باکوورییە |
| فرس بخاري - حصان بخـاري - قدرة حصانية | Horse power | ئەسپی هەڵمی- توانایی ئەسپی- یەکیەکە بۆ خەمڵاندنی توانای ئامرز و بزوێنەرە هەڵمییەکان، ئەو تواناییـەی کـە پێویسـتە بـۆ بەرزکردنـەوەی (٧٥)کغم بۆ بەرزایی مەترێك لە یەك چرکەدا. |
| فرس الركوب - جواد | Saddle horse | ئەسپی سواری |
| فرس توليد | Manipure = Lippizaner = brood mare | ماینی زاوزێ |
| فرس قزم إيسلاندي | Iceland Pony | پۆنی ئایسلاندی- ئەسپە گرگنەی ئوستورالی |
| فرس صغي = مُهر | Filly | جوانو- تۆما- بەچکەی ئەسپ یان ماین |
| فرس سويدي | Russ | ئەسپی سویدی |
| فرس هنغاري | Nonius | ئەسپی هەنگاری- ڕەنگەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە |
| فرس منغولي | Mongolian horse | ئەسپی مەنگۆلی |
| فرس امريكي | Morgan | ئەسپی ئەمریکی |
| فرس مُدَّرب | Made horse | ئەسپی مەشق پێکراو |
| فرس حرون | Balk | ئەسپی سەرکێش |

| | | |
|---|---|---|
| فرس البولو | Polo horse | ئەسپی پۆلۆ- ئەسپێکە یاری پۆلۆی پێ دەکرێت (یاریەکە لە سەر ئەسپ دەکرێت بە تۆپ و رێکتی دریژ). |
| فرس أسيوي - فرس آري | Asiatic (Aryan) horse | ئەسپی ئاسیاوی- ئەسپی ئاری |
| فرس عربي | Arabian horse | ئەسپی عەرەبی، ئەسپێکی جوانە. |
| فرس إنكليزي | English- blood horse | ئەسپی ئینگلیزی |
| فرس خَبّاب | Trotting horse or (Mare) | ئەسپی لۆقەکەر- ئەو ئەسپەی کەوا راهێنراوە هەر بە لۆقە بڕوات. |
| فرس جريح الركبة | Broken- kneed horse | ئەسپی ئەژنۆ شکاو یان بریندار. |
| فرس مسطك | Knock kneed or (Cow- hocked) horse | ئەسپی پەیزەن- ئەو ئەسپەی کە لە کاتی رۆیشتندا هەردوو ئانیشکی لە یەکتری نزیك دەبنەوە ئەمەش جۆرە نەنگی‌یەکە. |
| فرس البحر - حصان البحر | Sea-horse = Bellow- Fish | ماینی دەریا- ئەسپی دەریا- ماسی‌یەکی بچووکە سەری لە سەری ماین دەچێت. |
| فرس شامي | Syrian horse | ئەسپی شامی |
| فرس قزم - بوني - فرس جدمة | Pony | (پۆنی)- ئەسپە گرگنە- ئەسپێکی بچووکی سوکەڵەیە، نزیکەی ١٤٢سم بەرزە. |
| فرس (جَر) المحراث | Plough horse | ئەسپی جووت، ئەو ئەسپەیە کە جووتی پێ‌دەکرێت. |
| فرس الشطرنج | Knight | ئەسپی شەترەنج |
| فرس الرهان | Race- horse | ئەسپی رایز- ئەسپی غارغارێن |
| فرس مخص - فرس خَصي - خنذيذ | Castrated horse = Gelded horse | ئەسپی ئاختە- ئەسپی خەسێنراو. |
| فرس السهول | Mustang | (مەستانگ)- جۆرە ئەسپێکی دەشتەکی (کێوی)یە. |
| فرس للحمل - كديش - برذون | Pack horse | بارگیر- بارگیلی- یابوو- ئەسپی بار. |
| فرس الجَر - فرس العربات | Draft horse = carraige horse = draught horse | ئەسپی گالیسکە راکێشان- ئەسپی گالیسکە. |
| فرس الجَر الثقيل | Heavy- draught horse | ئەسپی راکێشانی باری قورس |
| فرس كميت | Bay (roan) horse | ئەسپی شێ- ئەسپی کوێت- رەنگەکەی لە نێوانی رەش و سوور یان قاوەیی و سووردایە. |
| فرس برزوالسكي | Equid przewaskii | ئەسپی پرزوالسکی، ئەسپێکی کێوی‌یە لە سیبریا و مەنگۆلیا دەژی. |
| فرس طائر = حصان طائر فل | Pegasus = Flying hourse | ئەسپی مەزن- ئەسپی فڕندە- کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باکوری‌یە. |
| فرسان = خيالة | Cavalry | سوارە- سوارچاکان. |
| فرساوس = قاتل المدوسا = حامل رأس الخول - برشاوش فل | Perseus | (پێرسیوس) هەڵگری سەری دێو، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باکوری‌یە |
| فرس (فحل) للأستلاء | Stallion | ئەسپی پەڕین- بۆ زاوزێ |
| فرسي - خيلي | Horsy = horsey = equine | ئەسپی، ماینی- هەر شتێك پەیوەندی بە ئەسپ یان ماینەوە هەبێت. |
| فرس ركوب و سحب ألماني | Hanoverian horse | ئەسپی سواریی و راکێشانی ئەڵمانی |
| فرس لونه كلون جلد الفار | Grullo | گرەلۆ- ئەسپێکی ئەمریکی‌یە رەشەنگی پێستەکەی لە رەنگی پێستی مشك دەچێت. |
| فرس أسكتلندي | Gallo way | گالۆوەی- ئەسپی سکۆتلاندی |

| | | |
|---|---|---|
| فرسخ | League = parasang | فرسەنگ- فرسق (٨) کیلۆمەتر یان (٤) کیلۆمەترە واتا ٣,٢٥ میل یان( ٥٢٥٠) مەترە. |
| فرسخ نجمي - بارسك | Parsec | (پارسیك)- فرسەقی ئەستێرەیی- یەکەیەکە بۆ پێوانی ماوەی نێوانی ئەستێرەکان، کە ئەکاتە ساڵی ڕووناکی. |
| فرسيون مائي | Water hoarhound = Gipsy herd = bitter bugle wort | پونگە ئاوی= گیا قەرەج |
| فرسيتية | Forsythia | (فۆرسیتیا)- درەختێکە لە کۆمەڵەی زەیتون گوڵەکەی لە زەنگۆڵە دەچێت. |
| فرسك دراق = دراقن | Peach tree | هەلوژە- درەختێکی بەردارە گوڵەکەی پەمەیی‌یە بەرەکەی خڕ و گۆشتن و ئاودار و بۆن و تام خۆشە دەنکەکەی ڕەق و بادەمی و تاڵە. |
| فرساء - برساء - افوكادو - زبدية | Avocado tree = persea | (ئەڤۆکادۆ)- درەختێکی بەردارە لە کۆمەڵەی زەیتون. |
| فرش | Bedding | ڕاخەر- ڕایەخ |
| فرشة الجذع | Bady brush | فڵچەی لەش- فڵچەی لەشی وڵاخ |
| فرش الضبع - شلطلة خشنة | Prangos = hayplant | گیایەکی دەشتەکی‌یە بۆ لەوەڕ باشە گوڵەکەی وورد و زەردە. |
| فرشة - فرشاة | Brush | فڵچە- بەتارە- فرچە |
| فرشة قش - طراحة | Paillase | جۆرێکە لە دۆشەك. |
| فرشة ملابس | Clothes brush | فڵچەی جل |
| فرشة حشية | Bed = mattress | دۆشەك |
| فرشة الزجاجة - فرشة البطل - فرشاة القناني - كنباثية | Callistemon = Bottle brush = callystum | (کالستمۆن)- فڵچەی شووشە- فڵچەی بوتڵ- درەختێکی هەمیشە سەوزە گەڵاکەی بۆن خۆشە لە بۆنی مۆرت دەچێت، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووە لە فڵچەی شووشە شتن ئەچێت، یان قەدەکەی لە بوتڵ دەچێت. |
| فرشة لغسل انابيب الأختبار | Brush of test tube | فڵچەی شتنی بۆری تاقیکردنەوە. |
| فرش البيت - اثاث | Furniture = house furniture | کەلوپەلی ناوماڵ |
| فرش الأسمدة | Spreading of manure | بڵاوکردنەوەی پەین لە سەر زەوی کشتوکاڵی. |
| فرش الحذاء - سلفه - ضبان | Sock = inner- sole = sheesock | ناو فەرشی پێڵاو |
| فرش الوقاية | Mulch | فەرشی پاراستن- ئەو گیاو گەڵاو پووشەی کە زەوی پێ دادەپۆشرێت بۆ پاراستنی لە سەرما. |
| فرشاة لغسل الدوارق براس مقوس | Brush with cured head | فڵچەی شتنی کەموڵە. |
| فرشة الأسنان | Tooth Brush | فڵچەی ددان |
| فرشة الشعر | Hair Brush | فڵچەی قژ |
| فرشة الحلاقة | Shaving Brush | فڵچەی ڕیش تاشین |
| فرشة الأظافر | Nail Brush | فڵچەی نینۆك |
| فرشة البوية | Paint Brush | فڵچەی بۆیە |
| فرشحة - فرشخة | Straddle | لنگ داپچڕین- ئاولنگ پان کردنەوە- ئاوگەڵ پان کردنەوە- لنگ داچەقاندن. |

| | | |
|---|---|---|
| فرشينه - فركيته - دبوس الشعر | Hair pin | تەوقەی سەر= تەوقەی قژ= گیرەی قژ، ئافرەت بەكاری دەهێنێت. |
| فَرْشَة | Stable litter = straw | نوێنی پووش- ئەو پووش و كایەیە كە لە ناو تەویلەدا دادەنرێت بۆ ئەوەی ئاژەڵ و وولاخ لە سەری بكەوێت. |
| فرصة | Opportunity | هەل- دەرفەت- ماوە- پشوو- ووچان- دەليقە= ووردەك. |
| فرصة - نوبة | Chance | نۆرە. |
| فرصة - عطلة | Vacation = reces | پشوو. |
| فرصاد - توت - كبوش | Mulberry = morus alba | توو- تووە سپیكە. |
| فرصد - فرصيد | Grapestone | دەنكی بۆڵە ترێ- تووی ترێ. |
| فرض | Duty | سەپاندن- سەرا سەپاندن. |
| فرض الضرائب - ضريبة | Taxation | داسەپاندنی باج. |
| فرض - تقدير | Supposition = Identation = Indentation | گریمان- قەبڵاندن |
| فَرَضية | Hypothesis | گرێ- ئەنگاری- گریمان- دانراو- دلوایەكە بە راست دائەنرێ ئینجا دلوائەكرێت كە بەڵگە بهێنرێتەوە بۆ سەلماندنی ئەو راستیە. |
| فرض رياضي | Datum = Data | راستی بیركاریانە، زانیاری بیركاریانە. |
| فرضية افوكادرو | Avogadro-hypothesis | گریمانی ئەڤۆگادرۆ- دەقی ئەم گریمانە دەڵێت- قەبارە یەكسانەكانی گازە جیاوازەكان هەمان ژمارە گەردیان تیادایە(لە هەمان پلەی گەرمی و پەستاوتندا). |
| فرضي - تقديري | Suppositional | گریمانی- خەملاندنانە |
| فرضي - نظري | Theoreticial = Hypothetic | تیوریانە- گریمانی‌یانە |
| فُرْضة - ثلمة - حزّ - فتحة | Gap = Incision = Crena = Notch | كون- كەلێن- كەل- درز |
| فِرضاخ - هاكية | Hakea | (هاكیا) دارو دەوەنێكی رازاندنەوەیە، گوڵی بچووك دەگرێت. |
| فرط - شدّة | Severity = Intensity | فرەیی- زۆریی، زەبر، تین |
| فرط، زيادة(سابقة) | Hyper | پێشگرێكە بە مانای(فرە، زۆری، پتری، سەروو) |
| فرط صوتي | Hyper Sonic | زۆر دەنگی- سەردەنگی، پەیوەندی هەیە بەو خێراییەوە كە پێنج ئەوەندەی یان زیارتی خێرایی دەنگە لە هەوادا. |
| فرط التألم - فرط الألم | Hyperalgesia = Hyperalgia | ئازاری زۆر، ئێشی زۆر |
| فرط الحموضية | Hyeracidity | زۆر ترشێتی- ترشێتی زۆر |
| فرط القلوية | Hyperalkalinity | زۆر قلیەیی- ئەلكالێتی زۆر |
| فرط التشبع - فوق التشبع | Super saturation | زۆر تێربوون- سەروو تێر بوون- باری ئەو شلەیەی كە زیاتر لە توانای خۆی مادەی تواوەی تیادایە. |
| فرط التبريد - تحت التبريد | Super cooling | زۆر سارد كردنەوە- فرە ساردكردنەوە. وەكو ساردكردنەوەی شلەیەك لە پلیەكی گەرمی نزم تر لە پلەی بەستنە ئاساییەكەی بە بێ ئەوەی كە بیبەستێت وەكو شووشە كە نمونەیەكە بۆ شلەیەكی زۆر ساردكراوە. |
| فرط النشاط | Hyperaction = Hyperenergia = Hypergasia | زۆری چالاكی- زۆری گورجێتی |

| | | |
|---|---|---|
| فرط العرق - رحضاء | Hyperidrosis = Hyperephidrosis = Hyperrhidrosis | زۆری ئارەق- ئارەق زۆری |
| فرط الضغط | Hyperplesia | زۆری پەستان- پەستان زۆری |
| فرط الوزن | Over weight | زۆر کێش- کێش زۆری |
| فرط الشحام | Hyperliposis | زۆر قەڵەویی- قەڵەوی زۆر- زۆری چەوری |
| فرط التنفس - لهاث | Hyperpnea | هەناسە بڕکێ- زۆری هەناسەدان |
| فرط اللعاب | Hyper salivation | لیکنی- زۆر دەردانی لیك |
| فرط احساس اللمس | Hyper aphia | زۆری هەستایەتی دەست لێدان- زۆری هەستایەتی پێست. |
| فرط الأنبساط | Hyper extension | زۆری کشان |
| فرط الحموضة | Hyper acidity | زۆری ترشێتی- ترشێتی زۆر |
| فرط النشاط | Hyper activity | زۆری چالاکێتی |
| فرط الحراك | Hyper kinesia | زۆری جووڵە- جووڵەیی زۆر |
| فرط الضغط | Hyper tension = Hyper piesia | زۆری پەستان- پەستانی زۆر |
| فرط التشنج | Hyperplasia | زۆری کرژی- کرژی زۆری |
| فرط الحرارة | Hyper thermia | زۆری گەرمی- گەرمی زۆری |
| فرط النمـو - تضخم | Hyper trophia = over growth = Hyper genesis | زۆر گەورە بوون |
| فـرط التوصيـل - فرط توصيلية | Superconductity | زۆر گەیاندنی کارەبا- فرە گەیاندنی کارەبا: بۆ نموونە لە هەندێ کانزای وەکو قورقوشم و جیوەدا ئەگەر بۆ پلەی سفری بێ پایان(پەتی) سارد بکرێتەوە. |
| فرط الأفراز | Hyper secretion | زۆر دەردان- فرە دەردان |
| فرط افراز اللبن | Hyper galactia | زۆر دەردانی شیر- زۆری شیر- شیر زۆری |
| فرط التعب | Apokamnosis | زۆر ماندوێتی- ماندوێتی زۆر |
| فرط التوتر | Hyper tention = over tone = Hyper tonia | زۆر کرژی |
| فرط الأجهاد - فرط الجهد | Over strain | زۆری ئەرك- ئەرك زۆری |
| فرط الحس (او الأحساس) | Hyper thymia = Hyperes thesia = Hyper sensitility | زۆری هەستایەتی |
| فرط سكر البول | Hypergly cosuria | زۆری شەکر لە میزدا |
| فرط السمّية | Hypertoxicity | زۆری ژەهر- ژەهر زۆری |
| فرط الأنتاج | Over production | بەرهەمی زۆر- زۆری بەرهەم |
| فرط التغذية | Hyper nutrition = over nutrition = Hyperalimentation | خواردنی زۆر- زۆر خۆراکی |
| فرط الرعّي | Over grazing | زۆر لەوەڕان- لەوەڕانی زۆر |
| فرط السقي | Overirrigation | زۆر ئاودان- ئاودانی زۆر |
| فرط التكلم - ثرثرة | Hyperphasia | زۆر بڵەیی، چەنەبازی، زۆر وتن |
| فرط النضج - قفول - قبوب | Over- ripening | زۆر پێگەیشتن- زۆر گەیین- گەیینی زۆر |
| فرط الدم - إحتقان | Hyperemia | زۆری خوێن- خوێن تێزان |

| | | |
|---|---|---|
| فرط سكر الدم = فطر كلوكوز الدم | Hyperglycemia = Hyperglycosemia | زۆری شەکری خوێن |
| فرط التعظم | Hyperostosis | زۆر گەورە بوونی ئێسیك |
| فرط ضغط الدم | Hyper tension = Hyperpiesie | زۆری پەستانی خوێن |
| فرط السمنة | Hyper adiposis | زۆر قەڵەوی- قەڵەوی زۆر |
| فرط العاطفية | Hyper affectivity | زۆر سۆزی- سۆزی زۆر |
| فرط املاح الدم | Hyper alonemia | زۆر خوێی لە خوێندا - خوێی زۆر لە خوێندا |
| فرط إفراز المذاكر | Hyper androgenisn | زۆر دەردانی ماددەی ئەندامی نێرینە |
| فرط الصعل = فرط قصر الرأس | Hyper brachycephaly | زۆر سەر بچووکی- سەر بچووکی زۆر |
| فرط التشبث = فرط العناد | Hyperbulia | زۆری کەللە شەقی- زۆر سووربوون لەسەر شتێك- قیرسچەمەیی زۆر |
| فرط كالسيوم الدم | Hyper calcemia | زۆری کالسیۆم لە خوێندا |
| فرط ثاني اوكيبد الكاربون في الدم | Hyper capnia = Hyper carpia | زۆری دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە خوێندا. |
| فرط الأسهال | Hyper catharsis | سك چوونی زۆر- زۆر سك چوون |
| فرط الأنشراح | Hypercenes thesia | دڵ خۆشی زۆر |
| فرط كلور الدم | Hyperchloremia | زۆری مادەی کلۆر لە خوێندا |
| فرط كولسترول الدم | Hyper Cholesteremia | زۆری کۆلسترۆل لە خوێندا |
| فرط الصفراء = زيادة إفراز الصفراء | Hypercholia | زۆری زراو- زۆر دەردانی شلەی زراو |
| فرط التغضرُف | Hyper chondroplasia | زۆری کرکراگە- کرکراگە زۆری |
| فرط التلون | Hyper chromatism | زۆری رەنگاو رەنگ بوون- زۆری رەنگ وەرگرتن |
| فرط عصارة المعدة | Hyperchylia | زۆر دەردانی ئاوکی گەدە- زۆری دەردانی شلاوی گەدە. |
| فرط الحركة | Hypercinesis = Hyper kinesia = Hyper motility | زۆری جووڵە- جووڵە زۆری |
| فرط إحساس بالبرد | Hyper cryalgesia = Hyper cryesthesia | زۆری هەست کردن بە سەرما- سەرما بردەڵەیی. |
| فرط الحمل | Hyper cyesis = super fetation | شفتە ژێکردن- زۆری سك پڕبوون- سك پڕبوونی ئافرەت یەك لە دوای یەك |
| فرط الكريات الحمراء | Hypercythemia | زۆری خڕۆکە سوورەکان لە خوێندا |
| فرط كريات البيضاء | Hypercytosis | زۆری خڕۆکە سپیەکان لە خوێندا |
| فرط إنبساط القلب | Hyperdiastole | زۆری کشانی دڵ |
| فرط الظمأ | Hyperdipsie | زۆری تینوێتی- تینویەتیەکی زۆر |
| فرط البول | Hyperdi | زۆری میز- میز کردنی زۆر |
| فرط الأسنان الأضافية | Hyperdontia | زۆردی ددانی زیادە- بوونی ددانی زیادە بە شێوەیەکی زۆر |
| فرط الأثغار | Hyperdontogeny | زۆری ددان دەرهاتن |
| فرط السمع - حدة السمع | Hyperchema | گوێ سووکی |
| فرط التميه | Over hydration | زۆر ئاویی- ئاو زۆری |
| فرط التقرن | Hyper keratosis | زۆر ڕەق بوون |

| | | |
|---|---|---|
| فرط التألم | Hyper algesia | زۆر ئازار چێژان |
| فرط الدم (تبيغ) | Hyperemia | زۆر خوێنی- خوێن زۆری |
| فرط التبريد | Super cooling | زۆر ساردکردنەوە |
| فرط التشبع | Super saturation | زۆر تێری |
| فرط التوصيلية | Super condutivity | زۆر گەیاندنیەتی هەندێك مەعدەن ئەگەر ساردبکرێنەوە بۆ نزیکی پلەی سفری سەدی بەرهەڵستی کارەباییان زۆر کەم دەبێت یان هەر نامێنێت. |
| فرط الضغط - فرط ضغط الدم | Hyper tension | پەستان زۆریی= زۆری پەستانی خوێن |
| فرط النمو | Over growth | زۆر گەشە کردن |
| فرط الأنفعالية | Hyperemotivity | زۆر شپرزە بوون= شپرزە بوونی زۆر |
| فرط نشاط الغدد الصم | Hyperendocrinism | زۆری چالاکی لووە کوێرەکان |
| فرط العصبية - فرط التهيج العصبي | Hyper erethism | زۆری تووڕە بوون- زۆر توڕە بوون- تووڕە بوونی زۆر |
| فرط الحديد في الدم | Hyperferremia = Hyperferricemia | زۆری ئاسن لە خوێندا |
| فرط البلوغ الباكر - فرط النمو التناسلي | Hypergenitalism | زوو باڵق بوون- زوو گەشەکردنی زەگەزی |
| فرط المذاق - حدة المذاق | Hypergeusia | چێژ سووکی= زوو چێشتنی تامی شت |
| فرط كلوكوز الدم | Hyperglycemia | زۆری کلۆکۆز لە خوێندا |
| فرط التبجح | Hypergnosia | فشە کردن- زۆر خۆهەڵکێشان |
| فرط المنسلية - فرط إفراز الغدد التناسلية | Hypergonadism | زۆری دەردانی لووە رەگەزیەکان وەکو زۆری دەردانی ماددەی رەگەزی لە لایەن گوون و هێلکەدانەوە. |
| فرط الهرمونية | Hyperhormonism | زۆری هۆرمۆن= زۆر دەردانی هۆرمۆن- هۆرمۆن زۆری |
| فرط المائية | Hyper hydration | زۆری ئاو= ئاو زۆری |
| فرط المناعة | Hyperimmunity | زۆری بەرگری- بەرگری زۆری |
| فرط بوتاسيوم الدم | Hyperkalemia | زۆری پۆتاسیۆم لە خوێندا |
| فرط الحيض | Hypermenorrhea | زۆری بێ نوێژی- بێ نوێژی بەتین. |
| فرط الأنسلاخ | Hypermetamorphosis | زۆری کاژ فڕێ دان |
| فرط القزمية | Hypermicrosoma | زۆری گرگنی |
| فرط المعدنية | Hypermineralization | زۆری کانزایی= کانزا زۆری |
| فرط التذكر = حدة الذاكرة | Hypermnesia = Hypermnesis | بیر تیژی |
| فرط النشاط العقلي | Hypernea | زۆری چالاکی ژیری |
| فرط نتروجين الدم | Hypernitremia | زۆری نایترۆجین لە خوێندا |
| فرط افراز الخصية - فرط نشاط الخصية | Hyperorchidism | زۆری دەردانی گون- زۆری چالاکی گون |
| فرط الشهية | Hyperorexia | زۆری ئیشتیا= ئیشتیا زۆری |
| فرط الشمّ = حدة الشم | Hyperosmia = Hyperosphresia | زۆری هەستی بۆن کردن |

| | | |
|---|---|---|
| فرط الأباضة = بكور جنسي في البنات | Hyperovaria = Hyperovarism | زۆری دەردانی هێلکە- زۆری دەردانی هێلکە لە هێلکەدانی ئافرەتدا. |
| فرط حموضية الدم | Hyperoxemia | زۆری ترشێتی خوێن |
| فرط الأوكسجين | Hyperoxia | زۆری ئۆكسجین |
| فرط التاكسد | Hyperoxidation | زۆری ئۆكسان |
| فرط بروتينات الدم | Hyperproteinemia | زۆری پرۆتینی خوێن |
| فرط التلعب - اللعابية | Hyperptyalism | لیكنی- زۆر دەردانی لیك |
| فرط النوم - كثرة النوم | Hypersomnia | زۆر نووستن |
| فرط التشحم | Hypersteatosis | زۆر دەردانی چەوری- زۆری چەوری |
| فرط الأثداء - كثرة الأثداء | Hyperthelia | مەمك زۆری- زۆری مەمك |
| فرط نمو الثدي - وطب = تضخم الثدي | Breast hypertrophy | زۆر گەورە بوونی مەمك |
| فرط اللزوجة | Hyperviscosity | لینجی زۆر- زۆری لینجی |
| فرعون | Pharaon | فیرعەون: یەكێكە لە پاشا میسرییە كۆنەكان. |
| فرعونية | Faro | فارۆ: جۆرێكە لە قومار بە كاغەز دەكرێت. |
| فرع (للشجرة) | Branch = bouah | لق = پەلك - لك - چڵ - چڵوپۆپ. |
| فرع عرض | Epicormic branch | لقی لا بەلا. |
| فرع - قسم | Division = section | بەش - لق. |
| فرع النهر | Distributary | لقی رووبار = زێ. |
| فرعة = قمل | Louse | ئەسپێ، گیاندارێكی مشەخۆرە. |
| فرع ثمري | Fruit branch | لقی بەردار = لقی درەختێك بەری پێوە بێت. |
| فرعي (للشجرة) | Ramal | لقی = پەلكی. |
| فرعي = جزئي | Minor = petty | دووەمین، زۆر گرنگ نەبێت. |
| فرع هوائي | Culms | لقی هەوایی. |
| فرع جانبي | Off shoot | لقی لاتەنیشت. |
| فرعل | Young hyena | بێچووە كەمتیار. |
| فرفح - ارض ملساء | Level = smooth land | زەوییەكی ساف و تەخت. |
| فرفارة - ديك الريح | Vane = weather cock | كەلەشێری با - ئامرازێكە بۆ پیشاندانی ڕێڕەوی با. |
| فرفوري خزف الصين | | چینی فەخفوری. |
| فرفورة = فرفورا | Pupura | لەپكـەی (سـەدەف) گیـاندارێكی دەریاییـە، ڕەنگـی ئەرخـەوانی لێدەردەهێنرێت. |
| فرفران = جندم هندي | Gamboge tree Garcinia Indica | گارسینای هندی - درختێكی كشتوكاڵی ناوچە گەرمەكانە بەرهەمەكەی هەمە جۆرەیەو دەخورێت و ئاوگێكی زەمقینی زەرد لە توێكڵی قەدەكەی دەردەهێنرێت. |
| فرفارة = حشيشة السعال | | بڕوانە (حشيشە السعال). |
| فرفر = فرفور | Small bird | چۆلەكەی بچووك، فیرنەگولە. |
| فرفر = فرفور = اخرق | Fickle | گەمژە - كێل - عەقل سووك. |

| | | |
|---|---|---|
| فرفرة - حافر المهر | Colts foot = Farfara | پێمایین - پێجوانوو = گیایەکی دەشتەکی‌یە لە هەمیشە بەهار ئەچێت، دەرمانی لێ دروست بۆ ئازاری سنگو بەهێزوکردن. |
| فرفورال - زيت النخل - زيت النخالة | Furfural | (فــەرفورال) شــلەیەکی ئەلدیهایدی‌یــە لــە تلپــەی مادەرووەکی‌یــەکان دەردەهێـنرێت، لــە دروســتکردنی گــەلێك ئاویتــەدا بــەکاردێت وەکــوو پلاستیكو دەرمانی لەناوبردنی گژوگیا. |
| فرفيران | Cambage = Campoge | (کامبۆجی) رووەکێکە دەرمانی رەوانی لێ دەر ئەهێنرێت. |
| فرفير | Porphyry | (پۆرفیری) بەردێکی ئاگرینە لە بلووری گـەورەی بـەرز پێکـهاتووە کـە لـە دەنکۆڵەی کانزایی تەنکدا چەسپ بوون بە رێژەی ٢٥٪. |
| فرفيرة = دوامة | Top = Spinning Top | مزراح |
| فرفــــر = ديــــك سـلطاني = برهــان فرفور - سـحنون - دجاجة القصب | Porphyrio = Gallinule = = reed hen | مریشـکی قامیشـەلان = باڵندەیـەکی ئـاوی شـینی مەیلـەو بنەوشـەیی‌یەو دەنووكو قاچی سوورە. |
| فرفت | Vervet | (ڤێرڤێت)مەیمونێکی بچووکە لە ئەفریقادا دەژی. |
| فرفرة | Purpura | لنگە قرتن، شەقەشەق پەرپیووری ئەخۆشی‌یەکە لە نیشانەکانی ئەوەیە کە پەڵەی وەنەوشەیی لەسەر پێست پەیدا ئەبێت. |
| فرفير - بنفسج | Violet | وەنەوشە - بنەوشە. |
| فرفيري - فرفري | Purpuric | دەنگی وەنەوشەیی. |
| فرفخ = لبينة | Wild purslane = purple spurge | شیرماری پەمبەیی - پەڵپینە کێویلە - جۆرێکە لە شیرمار شیراوێکی سپی پزیشکی هەیە بالووکە لائەبات‌و گوڵەکەی پەمەیی‌یە. |
| فرفحين - رجلة - بقلة حمقاء - فرفين - فرخين - فرفخ | Purslane = pussley weed | پەڵپینە - گیایەکی گۆشتینە لە ناو کێڵگەدا ئەروێت، ئەکرێت بە چێشت - پەرپونیە. |
| فرق - الفرق | Alphirk | (ئەلفەرق) ناوی ئەستێرەیەکە بە عەرەبی. |
| فرقاطة، حراقة | Frigate | ( فریگێت) کەشتێکی جەنگی‌ی چارۆکەدارە. |
| فرقاطة، طير الفرقاط | Frigate bird | (فریگێت) جۆرە باڵندەیەکی رەشی دەریایی‌یە، خواردەمەنی باڵندەکانی تر دەخـوات، تورەکەیـەکی رەنگـین وا بـە ژێـر قورگـی نێرەکەیـەوە لـە وەرزی جووت گرتندا پڤی ئەدات بە مەبەستی راکێشانی سەرنجی مێیەکەی. |
| فرقد | Calf | گوێرەکە = گۆلك. |
| فرق (في شعر الراس) | Parting (in hair) | خەتی ناوەراستی قژی سەر. |
| فرق (باق) (حساب) | Remainder | پاشماوە - ماوە. |
| فرق - ميزة | Distinction | رەوشت - تایبەتمەندی. |
| فرق = اختلاف | Difference | جیاوازی - جودایی. |
| فرق النحل - سرب النحل - ثول | | پوورەی هەنگ. |
| فرق - قطيع | Drove = Herd = Flock | گەلە = جەلەب |
| فرق - كتان مسهل | Purgative flax | رووکی کەتانی رەوانکەر. |
| فرق الجهد | Potential difference | جیاوازای ئەرك : جیاوازی ئەرکی کارەبایی، پێوەرێکە بۆ باری کارەبایی تەنەکان‌و لە ئەنجامی ئەو جیاوازی‌یەوەیە کـە تـەوژمی کارەبـایی تێپـەر دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| فرَق - فرع | Fright | ترس. |
| فرق عملة - صرافه | Exchange | جیاوازی پارە = جیاوازی دراو. |
| فرقعـة - طقطقـة - انفجار | Crepitation = Cracking = Crack = Detonation = Explosion = Blast | تەقەتەق - تەقینەوە = قرچە - شریخە. |
| فرقعة الاصابع | To snap fingers | پەنجە تەقاندن. |
| فرقدان - الدب الاصغر | | فارکاد = ئەستێرەی دوو براکە - جووتکـەی هـەنجیران = دوو ئەسـتێرەی گەش لە سەر ڕووی ورچی بچکۆلەوە. |
| فرقعة المفاصل | Joint crepitation | تەقەتەقی جومگە وەکو تەقەتەقی ئەژنۆ. |
| فرقة تمثيلية | Acompany of actors | تیپی نواندن. |
| فرقة باليه | Ballet Corps of ballet | تیپی سەمای باڵێ. |
| فرقة (عسكرية) | Division | |
| فرقة جوية (عسكرية) | Air division | |
| فرقة الاشبال | Pack = cub back | |
| فرقة كشافة | Boy troop | تیپی دیدەدوانی. |
| فرقـة = طائفـة - جماعة | Party = company = group = band = troop | تیپ. |
| فرقلة = سوط | Whip | قامچی. |
| فرقة = فيلق | Agmen = corps | |
| فرقة عسكرية | Detachment = Division = corps | تیپی سوپایی. |
| فرقة الجاز | Jazz band | تیپی جاز. |
| فرقة موسيقية | Music band = orchestra = troupe | تیپی مۆسیقا = ئۆرکسترا. |
| فرقة الاطفاء | Fire brigade | تیپی ئاگر کوژاندنەوە. |
| فرقة مسرحية | Acompany of actors | تیپی شانۆگەری |
| فرقة - فراق = افتراق | Separation | جیابوونەوە. |
| فرقان = برهان | Proof | سەلماندن. |
| فرقـع خنفسـاء مطقطقة | Snapbeetle = elater = | قالۆنچەی تەقەتەقکەر. |
| فرقيعة | Fire works | تەرەقە - دەمارقاچان. |
| فرك - دعك | Perfrication | پرواندن - هەڵگلۆفین. |
| فرك - دلك | Tomassage | شێلان. |
| فرك - فريك | Unriped | فریکە - فەریکە نوك. |
| فركتوز - سكر الفواكه | Fructose = levulose | فرکتۆز = شەکری میوە. |
| فركولة = هرض | Virachola | (فیراکولە) مێروویەکی زیان بەخشە لە هەنار دەدات. |
| فركن | Firkin | (فێرکین): ١)بەرمیلێکی تەختەی بچووکە. ٢) پێوانەیەکی ئینگلیزییە دەکاتە چارەکی بەرمیلێك. |
| فرك | Perfrication = Tere | |

| | | |
|---|---|---|
| قاموس - معجم | Dictionary | فەرهەنگ<br>کتێبێکە ووشە و زاراوەی بە زمانێك تێدایە بە پـێی پیتی ئەلف و بێ ڕیزکراون بەرامبەرەکانیان ماناکانیان نوسراون یان لە بەرامبەرەکانیاندا بە زمانێك یان دوو زمانی تـر بە هەمان مانا نوسراون ، وەکو فەرهەنگی زانستی ، فەرهەنگ گەلێك جۆری هەیە یەك زمان و دوو زمانی و سێ زمانی ... فەرهەنگی زانستی ، فەرهەنگی ئەدەبی .... |
| قاموس - بحر عظيم | Ocean = great sea | زەریا، ئۆقیانوس. |
| قاموس جوغرافي | Gazetteer | فەرهەنگی جوگرافی ، باسی جوگرافیا دەکات |
| قامة | fathom Stature | بەژن - درێژی١,٨٢م = بە ٦پێ ، یەکەیەکە درێژییەکەی (٦م) ە بۆ پێوانی قولایی دەریا بەکاردێ |
| قامة الإنسان | Stature | بەژن، بالا، قەد. |
| قامطة ، ملزمة | Clamp | مەنگەنە : بۆ گرتنی شتومەك |
| قانت | Alkanet | دەوەنی خەنە : دەوەنێکە لە ڕەگەکەی ڕەنگی سووری خەنە دەردەهێنرێت بۆ بۆیەکردنی قژی سپی |
| قانت مكلوره | | ( ماکلورا) دارو دەوەنێکە لە کۆمەڵەی توو وە لقەکانی دڕکاوییە ، گوڵ نێرو مێ دەگرێت ، بەرەکەی لە پرتەقاڵ دەچێت دەخورێت تەختەکەشی نەرم و قایم و زەردە بۆ گەلێك مەبەست بەکاردێت |
| قانصة الطير - قونصة | Gizzard | سیقەتۆرە ، سیقەدانە ، زیقەتۆرە ، بەشێکە لە گەدەی باڵندە |
| قانون | Kanoon | قانون : ئامرازێکی موسیقییە |
| قانون = دستور | Law | یاسا |
| قانوني - شرعي | Legal = Lawful | یاسایی - شەرعی |
| قانون علمي | Scientific law | یاسای زانستی = ڕێسایەکە ( دەستورێکە) باس لە دیاردەیەکی سروشتی تایبەتی دەکات لە سنوری تێبینی تاقیکارییانەدا |
| قانون ستيفس - قانون استيفن | Stefans law | یاسای ستیفان- هاوکێشەیەکە بۆ دەرهێنانی بەهای ئەو وزەیەی کە لە لایەن تەنێکی ڕەشەوە دەدرێتەوە |
| قانون شارل | Charles law | یاسای شارل - قەبارەی بارستەیەکی دیاری کراو ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبێت لەگەڵ پلەی گەرمی کە تێدایە بە مەرجێك پەستانە ئاراستەکراوەکە جێگیربێت |
| قانون فاراداي للحث المغناطيسي | electromagnetic induction | یاسای فارادای بۆ هاندانی ئەلیکترۆ ماگناتیکی. |
| قانون غايلوساك | | یاسای گایلۆساك = پەستانی بارستەیەکی دیاریکراو لە غاز ڕاستەوانە هاوڕێژە بێت لەگەڵ پلەی گەرمی پەتیدا بە مەرجێك قەبارە جێگیر بێت |
| قانون گراهام لانتشار الغازات = قانون گراهام للتنافذ | diffusion | یاسای بڵاوبوونەوەی ( گوزەرکردنی) گراهام : خێرایی لە یەکتریدا بڵاوبوونەوەی گازەکان بە بەربەستێکی کونیلەداردا بە پێچەوانە لەگەڵ ڕەگی دووجای ئەو گازانە هاوڕێ دەبێت لە هەمان باری پەستان و گەرمیدا |
| قانون حفظ الطاقة | Law of conservation of energy | یاسای پاراستنی وزە: لە هەر کارلێکێکی کیمیایدا وزە لەناو ناچێت و ناهێنرێتە بوون |
| قانصة الذباب | Fly catcher | مێشگرە ، مێش خنکێنەر ، جۆرێکە لە ڕووەك |
| قانصة الحشرات | Insect catcher | مێروگر ، کۆمەڵە ڕووەکێکە گەڵاکانیان مێروو دەگرن |

| | | |
|---|---|---|
| قانون | Law = rule = canon | یاسا ، دەستور ، كۆمەڵەی ئەو ڕێسایانەی كە پەیوەندیيە كۆمەڵایەتی‌یەكان ڕێك دەخەن |
| قانون ، بيانوقيثاري | Harpsichord | سەمتوور ، قانون ، ئامرازێكی موسیقایی ژێ‌یە |
| قانوني | Legal = lawful = canonical | یاسایی ، دەستووریی، هەرشتێك پەیوەندی بە یاساوە هەبێت. |
| قانون النسب، الثابتة | Law of definite (or) Composition or proportions | یاسای ڕێژە جێگیرەكان - هەر ئاوێتەیەكی كیمیایی پاك هەمیشە لە هەمان ڕێژەی كێش جێگیر پێكهاتووە بە هەر ڕێگەیەك ئەو ئاوێتەیە ئامادەكرابێت |
| قانون حفظ الكتلة | Law of conservation of mass | یاسای پاراستنی بارستایی : لە هەر كارلێكێكی كیمیایدا ، بارستە لەناوناچێت و ناهێنرێتەبوون |
| قانون الضغوط | Law of pressure | یاسای پاڵەپەستۆ. |
| قانون لنز | | یاسای لینز = ئەگەر مگناتیسێك خرایە كلافە تەلێكی كارەبایی‌یەوە ئەوا تەوژمی كارەبایی هاندراو دەبێتە هۆی پەیدا كردنی كایەیەكی موگناتیسی ئەوتۆكە موگناتیسەكە فڕێ دەداتە ئەولاوە |
| قانون العدسات | Lens formula | یاسای زەرەبینەكان - یاسایەكە پەیوەندی نێوانی زەرەبینی و تەن وێنە پیشان دەدات. |
| قانون اوم | | ڕێژەی ئەركی ( ڤۆلتی) جێگیر لە نێوان دو خاڵدا لە بازنەی كارەباییدا بۆ ئەو تەوژمە بەردەوامەی كە بە نێوان ئەو دوو خاڵدا تێپەڕ دەبێت جێگیر دەبێت |
| قانون الانعكاس | Laws of reflection | دوویاسایەكەی ڕەت بوونەوە = پەیوەندیان بە ڕەت بوونەوەی تیشكی ڕووناكی‌یەوە هەیە كەبە ر ڕوویەكی ساف دەكەوێت |
| قانون الانكسار | Laws of refraction | دوویاساكەی شكانەوە : پەیوەندی بە چۆنیەتی شكانەوەی تیشكی ڕووناكی‌یەوە هەیە |
| قانون فعل الكتلة | Mass action law | یاسای‌كاری بارستە : تێكڕایی خێرایی ( ڕێژەی) كارلێكی كیمیایی چوون یەك ( هاوڕەگەز)، لە پلەیەكی گەرمیی جێگیردا لەگەڵ پەتی مادە كارلێك كردووەكاندا ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبێت. |
| قانون كيمياوي | Chemical law | یاسای كیمیایی جۆرو ڕێژەی توخمەكانی ناو گەردیلە دەردەخات. |
| قانون دولي | International law | یاسای جیهانی ، یاسای نێودەوڵەتی |
| قانون رياضي | Mathematical law | دەستوری بیركاری |
| قانون الحركة | | یاسای جوڵانەوە |
| قانون تجاري | Commercial law | یاسای بازرگانی |
| قانون الضمان الاجتماعي | | یاسای دەستەبەری كۆمەڵایەتی |
| قانون للعقوبات | Penal law | یاسای سزادان - ئەو یاسایەیەكە تاوان و تاوانباران و چۆنیەتی سزادانیان دەست نیشان دەكات |
| قانوني = مشرع | Lawgiver= law maker = legislator | یاساناس ، دەستوورناس، یاسا دانەر. |
| قان (قاني) - احمر قاتم | Dark red | سووری تێر = سووری تۆخ |
| قاورمة = قورمة | Preser red cooked meat | قاورمە - گۆشتی سوورەوەكراوی هەڵگراو لە كوپەڵەدا |
| قانون مولر | | یاسای مولەر - هەر دەمارێك هە رچۆنێك ووریا بكرێتەوە _ بوروژێنرێت) هەر ئەوە هەستە دەدات كە تایبەتی بە خۆیەتی |

| | | |
|---|---|---|
| قانون راؤلت | Raoult law | یاسای رائۆلت = یاسایەکە پەیوەندی نێوان بەرزبوونەوەی پلەی کوڵان و نزمبوونەوەی پلەی بەستین توێنەرەوە لەگەڵ کێشی گەرمی مادە تواوەکەدا لیشان دەدات |
| قانون ریختر | | یاسای ریختەر = یاسی یەکگرتنی نێوان مادە ترشەکان و مادە تفتەکان دەکات |
| قانون روبین | | یاسای رۆبین- یاسایەکە پەیوەندی نێوانی کاری پەستان و پلەی گەرمی بەسەر هاوسەنگی کیمیایدا پیشان دەدات |
| قانون ولنر | | سیاسای ولنەر = نزم بوونەوەی پەستانی هەڵمی گیراوەیەك لەگەڵ بڕی مادە تواوەکەی ناوگیراوەکە دا هاوڕێژە دەبێت بە مەرجێك مادە تواوەکە مادەیەکی پەرشەوەبوو نەبێت |
| قانون اللزوجة لماکسویل | Maxwell law of viscosity | یاسای لینجی ماکسویل- لینجی گاز پەیوەندی نییە بە پەستانەوە نە پەستانی زۆر و نە پەستانی کەم |
| قانون ماکسویل | | یاسای ماکسویل، ئەم یاسایە پەیوەندی بە هاندانی موگناتیسی کارەباییەوە هەیە |
| قانون التبادل الحراري | Law of heat exchange | یاسای ئاڵوگۆڕی گەرمی |
| قانون شارل = قانون شارلي غایلوساك | Charles law = charles = gaylussac law | یاسای شارل ( یاسای شارل گایلوساك) = قەبارەی برێکی دیاریکراو لە هەر گازێك ( لە پەستانێکی جێگیردا) ڕاستەوانە هاوڕێژەی دەبێت لەگەڵ پلەی گەرمیدا بە مەرجێك کارلێکی کیمیایی تێدا ڕوونەدات |
| قانون بروستر | | یاسای بروستەر - یاسایەکە پەیوەندی بە ڕووناکییەوە هەیە |
| قانون بریفوست لتبادل الحرارة | exchange | یاسای پریفۆست بۆ ئاڵوگۆڕکردنی گەرمی = دەقی یاساکە دەڵێت :ئەگەر تەنێك لە پلەی گەرمی کەشی دەوروپشتیدا بێت بە هەمان تێکرایی گەرمی دەدات یان وەردەگرێت |
| قانون ستیفان بولتنزمان | | یاسای ستیفان بولتزمان - ئەم یاسایە پەیوەندی نێوان ئەو گەرمییەی کە لە لایەن تەنێکەوە پەرت و بڵاو دەبێتەوە لەگەڵ پلەی گەرمی تەنەکە خۆیدا پیشان دەدات. |
| قانون کیرشوف للاشعاع | radiation | یاسای کیشۆف بۆ تیشکدانەوە = تێکرایی تیشکدانەوەی گەرمی یان مژینی گەرمی لە لایەن تەنێکەوە لەسەر پلەی گەرمی پەتی و سروشتی ڕووی تەنەکان بەندە. |
| قانون افوجادرو | | یاسای ئەڤۆگادرۆ= دەقی ئەم یاسایە دەڵێت : قەبارە یەکسانەکانی هەموو گازەکان ( ئەگەر لە هەمان پلەی گەرمی و پەستان دابن) ژمارەیەکی یەکسان گەردیان تێدایە. ژمارەی ئەڤۆگادرۆ = ٦,٠٢٣ x ١٠ ٢٣ |
| قانون بلانك | | یاسای پلانك = دەقی ئەم یاسایە دەڵێت : کە تیشکی ئەلیکترۆموگناتیسی لەگەڵ مادە کارلێك دەکات ، هەروەکو لە چەپکی بچوك لە وزە ( کوانتەم) پێك هاتبێت ، بڕی وزە لە هەر چەپکێکی ( کۆانتەم) دیاری کراودا لەسەر درێژی شەپۆلی وزەکە دەوەستێت. |
| قانون التربیع العکسي | Inverse- square law | یاسای دووجاکردنی پێچەوانەیی - دەقەکەی دەڵێت: تینی ئەو وزەیەی کە لە خاڵێکی سەرچاوەوە دێت بەپێی دووجای دووری لەسەرچاوەکەوە کەم دەکات |
| قانون جول | | یاسای جول - دەقی یاساکە دەڵێت : ئەو گەرمییەی کە لە مادەیەکی گەیەنەردا پەیدا دەبێت لە ئەنجامی تێپەڕبوونی تەوژمیکارەباوە لەگەڵ بەرهەڵستی گەیەنەرەکە و دووجای تینی تەوژمەکە و ماوەی ( کاتی ) تێپەڕبوونیدا هاوڕێژە دەبێت |

| | | |
|---|---|---|
| قانون دولونك وبتيت | Law of dulong and petit | یاسای دۆلۆنگ و پتیت گەرمی گەردیلەیی توخمە ڕەقەکان بریتییە لە ژمارەیەکی جێگیر و دەکاتە نزیکەی ٦،٣ ، لەگەڵ ئەمەشدا ئەو توخمە نایبەتیانەی کە کێشی گەردیلەیی نزم و پلەی شلەوەبوونی بەرزیان هەیە ، گەرمی گەردیلەیی زۆر کەمتریان هەیە لە پلەی گەرمی ئاساییدا |
| قانون كولدبرك وفاكة - قانون فعل الكتلة | Law of Guldberg and wage | یاسای گوڵد بێرگ و ڤاکە - یاسای کاری بارستە |
| قانون التشابه البلوري - قانون مجرليش للتشابه البلوري | isomorphism | یاسای میجەرلیش، دەربارەی لێکچوونی بلووریی = ئەو مادانەی (ئاوێتانەی) کە لە شێوەی بلووری و ڕەوشتی کیمیایدا لە یەکتری دەچن دەشێت کە بە شێوکی کیمیایی لێکچوو بنوێنرێت |
| قانون الضغوط الجزئية لدالتن | pressures | یاسای پەستانە بەشەکانی داڵتۆن - ئەگەر دوو گاز یان زیاتر لە شوێنێکی داخراودا تێکەڵ کران بە مەرجێك کارلەیەك نەکەن ،ئەوا پەستانی گشتی تێکەڵاوە گازیەکە دەکاتە کۆی پەستانە بەشییەکانی پێکهێنەرەکانی ئەو تێکەڵاوە |
| قانون سنيل | | یاسای سنیڵ = یاسایەکە پەیوەندی بە شکانەوەی ڕووناکییەوە هەیە |
| قانون دارسي | | یاسای دارسی - یاسایەکە پەیوەندی بە زانستی جوغرافیاوە هەیە |
| قانون فرل | | یاسای فێرێل = یاسایەکە پەیوەندی بە زانستی جوغرافیاوە هەیە |
| قانون بليفر | | یاسای بلیفر - یاسایەکە پەیوەندی بە زانستی جوغرافیاوە هەیە |
| قانون القوة السادسة | Sixth power law | یاسای هێزی شەشەم = یاسایەکە پەیوەندی بە زانستی جوغرافیاوە هەیە |
| قانون بايزبالوت | s law | یاسای بایزبالۆت - یاسایەکە پەیوەندی بە ڕێڕەوی (با)وە هەیە لە نیوە خڕۆکی باکووری و باشووری زەویدا |
| قانون بويل - قانون ماريوت | law | یاسای بۆیڵ ( یاسای ماریۆت) - قەبارەی بارستەیەکی دیاری کراو لە گاز بە پێچەوانەوە هاوڕێژە دەبێت لەگەڵ ئەو پەستانەی کە دەخرێتە سەری بە مەرجێك پلەی گەرمی جێگیر بێت. |
| قانون فاراداي للتحليل الكهربائي | | یاساکانی فارادای دەربارەی شیکردنەوەی کارەبایی :<br>١. کێشی مادە شیبووەکان یان نیشتووەکان یان دەرپەڕیوەکان ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبێت لەگەڵ بڕی ئەو کارەبایەدا کە بە گیراوەکانیاندا تێپەڕ دەبێت.<br>٢. کێشی ئەو مادە جیاوازانەی کە بە تێپەڕاندنی تەزوویەکی کارەبا دەردەپەڕن یان دەنیشێن یان شیدەبنەوە ، ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبن لەگەڵ کێشە هاوهێزەکانیاندا |
| قانون هيس | | یاسای هیس، ئەگەر کارلێکێك بە چەند هەنگاوێك ڕوویدا، گەرمییەکەی دەکاتە کۆی گەرمی کارلێکی هەموو هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی کارلێکەکە، بەرەچاوکردنی ئەوەی کە ئایا ئەو هەنگاوە گەرمیدەرە یان گەرمی مژە. |
| قانون التوازن لفانت هوف | equilibrium law | یاسای هاوسەنگی ڤانت هوف = پەستانی دەلاندنی گیراوەیەکی ڕوون دەکاتە ( یەکسانە) بەو پەستانەی کە مادەیەکی تواوە پەیدای دەکات ،ئەگەر لەباری گازیدا بێت و هەمان قەبارەی گیراوەکەی داگیرکردبێت لە هەمان باردا |

| | | |
|---|---|---|
| قانون التعادل ( التكافوء) الكيميائي الضوئي | Law of photo-chemical equivalence | یاسای هاوکێشی ( هاوهێزی) کیمیایی ڕووناکی - هەر بڕێکی وزەی تیشکدانەوە کە لە ڕێگەیەکی کیمیایی ڕووناکییانەدا هەڵبمژرێت دەبێتە هۆی لێکهەڵوەشانی ( شیکردنەوەی) گەردێك |
| قانون انشتاين للتعادل (للتكافوء) الكيميائي الضوئي | Einstein law of photochemical equivalence | یاسای ئەنشتاین بۆ هاوهێز ڕووناکی کیمیایی |
| قانون هاردي شولز | Hardy- schulze law | یاسای هاردی شولز - چالاکی ئایۆنێك وەك کارکەرێکی مەیینەر زۆر بەتین لەگەڵ هاوهێزییەکەی ( واتە لەگەڵ ژمارەی ئەو بارگانەی کە هەڵی دەگرێت ) هاوڕێژە دەبێت |
| قانون هاوي | | یاسای هاوی- هەموو مادەیەکی بلووریی کە پێکهاتێکی کیمیایی دیاری هەبێت، شێوەیەکی بلووری جۆریی تایبەتی دەبێت. |
| قانون هنري | | یاسای هنری - کێشی ئەو گازەی کە لە قەبارەیەکی دیاری کراوی شلەیەکدا دەتوێتەوە لەگەڵ پەستانی ئەو گازەدا ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبێت ، ئەگەر پلەی گەرمی جێگیربێت |
| قانون الغازات العام | General law of gases | یاسای گشتی گازەکان - یاسایەکە پەیوەندی نێوانی قەبارە و پەستان و پلەی گەرمی پیشان دەدات |
| قانون النسب المضاعفة | Law of multiple proportions | یاسای ڕێژە چەندجارەکان : کە دوو توخم یەکدەگرن بۆ پێکهێنانی زیاتر لە ئاوێتەیەك ، ئەوا ڕێژەیەکی ژمارەیی ساکار لە نێوانی کێشە جیاوازەکانی یەکێك لەو دوو توخمەدا هەیە کە لەگەڵ کێشێکی دیاری کراو لە توخمەکی تر یەکدەگرن |
| قانون النسب المتبادلة | Law of equivalent (or reciprocal) proportions | یاسای ڕێژە ئاڵوگۆڕەکان - ئەگەر دوو توخم هەریەکە بە جیا لەگەڵ توخمی سێهەمدا یەکیان گرت ، ئەوا ڕێژەی نێوانی کێشی یەکەم و دووەم کە لەگەڵ کێشێکی جێگیر لە توخمی سێهەم دەبێت ، ئەگەر یەکەم و دووەم ڕاستەوخۆ لەگەڵ یەکتری یەکبگرن . |
| قانون غايلوساك الحجوم المتقاطة = قانون الحجوم لغايلوساك | of combining volumes | یاسای قەبارەی گازە کارلێك کردووەکانی گایلۆساك - قەبارەی ئەو گازانەی کە لە کارلێکێکی کیمیاییدا بەشداردەبن یان دێنە بەرهەم ، لەگەڵ یەکتردا هاوڕێژە دەبن بە ڕێژەیەکی ژمارەیی سادە ئەگەر لە هەمان باری پەستان و پلەی گەرمیدا پێورابن . |
| قانون بلاجدن، قانون بلاكدن | | یاسای بلاکدن= یاسایەکە دەقەکەی دەڵێت نزم بوونەوەی پلەی بەستنی توێنەرەوە ( مذیب ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبێت لەگەڵ پلەی پەیتی ( ترکیز) تواوەکە. |
| قانون نرنست - معادلة نرنست | | یاسای نێرنست - یاسایەکە دەقەکەی ئەوەیە کەوا: توانەوەی خوێیەك لە گیراوەیەکدا کەم دەبێتەوە ، وە بە بوونی خوێیەکی تر لە گیراوەیەکدا کە ئایۆنێکی بەشداری هەبێت لەگەڵ خوێی یەکەمدا |
| قانون نشوء الاحياء | Biogenetic law | یاسای پەیدابوونی زیندەوەران - یاسایەکە دەقەکەی دەڵێت: کەوا بارەکانی ( قۆناغەکانی) گەورەبوونی تاکە زیندەوەرێك مێژووی ڕەچەڵەکەکەی دەگێڕێتەوە ( پیشان دەدات) |
| قانون هبل | Hubble law | یاسای هەبڵ = ئەو یاسایەیە کە لە لایەن ( ئیدوێت هەبڵ) ەوە لە ساڵی ١٩٢٩دا پێشنیارکراوەو دەڵێت : کەوا پەیوەندییەکی درێژی ( هێڵی) لە نێوانی دووری کاکێشانەکان .( گالاکسییەکان) لە ئێمەوە و خێرایی گرژبوون یان چوونیەکی ئەو کاکێشانەدا هەیە |

| | | |
|---|---|---|
| قانون تتابع الطبقات | Law of superposition | یاسای بەدواهاتنی چینەکان - یاسایەکە باسی سەردەمە جیولۆجی‌یە کۆنەکان دەکات |
| قانون هوك | Hooke s law | یاسای هووك - لە مادەی جیڕ دا ( جیڕی) ئەرك وئەرکدانەوە هاوڕێژە دەبن |
| قانون ڤانت هوف | Vant hoff s law | یاسایەکی کیمیایی‌یە دەقەکەی دەڵێت کەوا: خێرایی کارلێ‌ی کیمیایی دوو یان سێ جار پتر دەبێت ئەگەر پلەی گەرمی (١٠) پلەی سەدی پتر بێت |
| قانون کولراوش | Kohlrausch s law | یاسای کولراوش - گەیاندنی کارەبایی هاوهێز ( ئەگەر گیراوەکە لەوپەڕی روون کردنەوەدا بێت ) بریتی‌یە لە ئەنجامی کۆکردنەوەی ( کۆی) دوو بەها یەکەم لەسەر کاتایۆن و دووەم لەسەر ئەنایۆن وەستاوە |
| قانون اوکتافس - قانون الثمانیات لنیولاندز | Octave s law = newland s octaves | یاسای ئۆکتافس - ( یاسای هەشتەمی نیولاندن)- یاسایەکە توخمەکانی خشتەی خولی بەشێوەی کۆمەڵەی هەشتی ڕێك دەخات |
| قانون التخفیف استوالد | Ostwald s dilution law | یاسای ڕوونکردنەوەی ئوستواڵد - یاسایەکە پەیوەندی نێوانی پلەی ئایۆنین لە گیراوە لاوازەکاندا پیشان دەدات |
| قانون دوري = القانون.الدوري للعناصر - قانون مندلیف قانون الدوري للعناصر | Periodic law = mandeleeff s law = mandeleev s law | یاسای خولی - یاسای مەندەلیف : ڕەوشتەکانی توخمەکانی بەڵگەیەکی (نیشانەیەکی) خولین بۆ کێشە گەردیلەیی‌یەکانی ئەو توخمانە ، ( ڕەوشتی توخمە کیمیاییەکان بە شێوەیەك خولی _ دوری) دەگۆڕێن ئەگەر ئەو توخمانە بە پێی پتر بوونی ژمارەی گەردیلەیی‌یەکانیان ڕیز بکرێن. |
| قانون هاردي ڤاینبرك | Hardy weinberg law | یاسای هاردی ڤاینبرگ - یاسایەکە باسی چۆنیەتی گواستنەوەی ڕەوشتی زگماکی لە خێڵ و هۆزەکاندا دەکات |
| قانون دالتون للذوبان | Dalton s law | یاسای داڵتۆن دەربارەی توانەوە - ئەگەر تێکەڵاوێك لە چەند گازێك درایە بەر شلەیەکی توێنەرەوە ، ئەو بڕەی کە دەتوێتەوە لە هەر گازێك لەو تێکەڵاوە لەگەڵ پەستانی بەشی ئەو گازانە ڕاستەوانە هاوڕێژە دەبێت |
| قانون ڤین ( وین) للأزاحة | Wien s displacement law | یاسای لابردنی ڤین - یاسای وین بۆ لابردن : وزەی تیشکدانەوە بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی پتر دەبێت، ئەگەر پارچەیەك ئاسن گەرم بکەین دەبینین کە ڕەنگەکەی دەگۆڕێت لە سوورەوە بۆ پرتەقاڵی بۆ زەرد و لە کۆتاییدا بۆ سپی |
| قانون کولوم | Coulomb s law | یاسای کولوم - پەیوەندی‌یەکی بیرکاری‌یانەیە ، هێزی یەکتر ڕاکێشان یان لە یەکتر دوورکەوتنەوە لە نێوان دوو تەنی بارگەکراودا دەست نیشان دەکات ، بەهای ئەم هێزە لەسەر بڕی هەردوو بارگەکە و ماوەی نێوانیان و جۆری ئەو تەنەی کە دەکەوێتە نێوانیان دەوەستێت |
| قانون لنتس | Lenz s law | یاسای لێنس - دەقی یاساکە دەڵێت: ڕێڕەوی تەوژمی کارەبای هاندراو هەمیشە بە پێچەوانەی کایە موگناتیسی‌یەکەی دەبێت |
| قانون النسب الثابتة | Definite proportions law | یاسای ڕێژە جێگیرەکان- دەقی یاساکە : ڕێژەی نێوانی ژمارەکانی گەردیلەکانی ئەو توخمانەی کە ئاوێتەیەك پێك دەهێنن ، ڕێژەیەکی جێگیرە و لە ژمارەی تەواو پێك هاتووە |
| قانون کبلر - قوانین کبلر | Kepler s laws | یاسای کیپلەر ( یاساکانی کیپلەر ) - سێ یاسان پەیوەندیان بە جوڵانەوەی هەسارەکانەوە هەیە ، لە لایەن زانا ( یۆهان کیپلەر )ەوە دانراون |
| قانون بیر | Beer s law | یاسای بیر |
| قانون کورفوازیية | Courvoisier s law | یاسای کورڤۆزیە - دەقی یاسایەکە: لە گیرانی زراوە بۆری هاوبەش بە هۆی بەردەوە دەبێتە هۆی پووکانەوەی تورەکەی زراو ، بەڵام گیرانی ئەم بۆریە بە هەر هۆیەکی تر ئەبێتە هۆی ئاوسانی تورەکەی زراو. |

| | | |
|---|---|---|
| قانون نيوتن | | یاسای نیوتن |
| قانون النسبية | Law of relatively | یاسای بە گوێرەیی = یاسای نایەتی : بریتییە لە بیروڕای زانا ئانشتاین دەربارەی گەردوون لەسەر ئەو بنچینەیەی کەوا پێوەرەکانی شوێن و کات شتێکی ناپەتین واتە بە گوێرەیین |
| قانون ستارليك | | یاسای ستارلینگ |
| قانون والير | | یاسای والێر |
| قانون مندل الاول ، مبدا الانعزال، قانون الانعزال | principle (law) of segregation | یاسای یەکەمی مەندل- یاسای جیابوونەوە- یاسای گۆشەگیری یاسایەکی زکماکییە جیابوونەوەی جووتە جیبنەکان لە یەکتری و دابەش بوونیان بۆ خانەی ڕەگەزیی جیاواز. ئەگەر دوو زیندەوەر لە جۆرێك ڕەوشتی چاکی دژ بە یەکتردا جیاواز بوون ئەوا یەکێك لەو دوو ڕەوشتە لە نەوەی دووەمدا بە ڕێژەی (٣) زاڵ و (١) بەزیو دەردەکەونەوە. |
| قانون مندل الثاني - مبدا التوزيع الحر (المستقل) | principle (law) of independent assortment | یاسای دووەمی مەندل-یاسای دابەش کردنی ( سەربەخۆ) یاسایەکی زگماکییە هەر جووتێك لە کاکەرەکان ( جینەکان) بە شێوەیەکی سەربەخر دابەش دەبێت واتا پەیوەندی نابێت بە دابەش بوونی جووتەکانی ترەوە لە کاتی پێکهێنانی گەمیتەکاندا ، ئەگەر دوو زیندەوەر لە دوو ڕەوشتی پاکی دژبە بەکتری یان زیاتردا جیاوازبوون ئەوا لە کاتی پێکهێنانی گەمیتەکانی بەرە( نەوە)ی یەکەمیاندا دوو کارەکە دەکەی هەر چۆنێك لەو ڕەوشتانە لە یەکتری جیادەبنەوە بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە جیابوونەوەی دوو کارەکەی جووتەکانی تر و هەردوو ڕەوشتەکانی هەر جووتێك لە نەوەی دووەمدا بە ڕێژەی ٣ زاڵ و ١ بەزیودا دەردەکەونەوە |
| قانون فجنر | | یاسای فیجنەر - گۆڕان لە هەست کردندا زۆر بێت یان کەم ، بە ڕێژەیەکی دیاری کراو ڕوودەدات ، ئەم ڕێژەیش لە هەر هەست کردنێکدا جێگیرە |
| قانون ويبر | | یاسای وێبەر - جیاکردنەوە لە نێوان زۆریی و کەمی لە تینی کارتێکەردا ( المؤثر) لەسەر ڕێژەی گۆڕان لە تینی کارتێکەردا بۆ ڕێژەی بەر لە ڕوودانی گۆڕانەکە وەستاوە |
| قانون بود - قاعدة بود | | یاسای بۆد - یاسایەکە پەیوەندی بە زانستی ئەستێرەوانییەوە هەیە لە لایەن زانای ئەڵمانی ( بۆهان بۆد) لە ساڵی ١٧٧٢ ز دا دانراوە ، دەڵێت کەوا هەسارەیەك هەیە لە بۆشایی نێوان مەریخ و موشتەریدا |
| قانون الجاذبية | Law of gravitation | یاسای هێزی ڕاکێشانی زەوی |
| قاوون ، شمام بطيخ اصفر | Cautaloupe = santawi-melon = musk melon | شەمامە ، کاڵەك ، کاڵەکی زەرد ، جۆرە کاڵەکێکی زەردی گەورەی قاش قاشە |
| قاوون هندي | Gherkin | جۆرێکە لە ڕووەکی کولەکە تونکلی بەرەکەی قاش قاشە ڕەنگی سەوز و زەردی هەی بۆ چێشت بەکار دێت |
| قاووق | Atallhat, hood | کڵاوێکی درێژ |
| قاورمة= قورمة | Preserved cooket meat | گۆشتی سوورەوکراوی هەڵگیراو لە کوپەڵەدا. |
| قاوند ، قائد السمك ، قيون ، قرلي | Kingfisher = alcedo= haleyon | ماسیگرە ، جۆرە باڵندەیەکە هێلانەکەی لە کونی زەویدا دەکات |
| قايش الموسى = مشمذة | Razor strop | قایش چەقۆ تیژکردن |
| قب ، اصل الذنب | Coccyx | بێخی کلك ، بنی کلك لە گیانداردا |

| | | |
|---|---|---|
| قب | Telson | دوائەلقەی سکی گیانداره توێکلدارەکان |
| قب الدولاب (العجلة) = وسط الدولاب | Nave-hub | ناوەڕاستی ڕەوڕەوه یان پێچکە |
| قب الدولاب ، ثقب الدولاب | Axle-box | کونی ڕەوڕەوه یان پێچکە کە تەوەرەکەی تیا دەجولێتەوه |
| قب الميزان ، عتلة الميزان | Beam of balance = lever of balance | میلی تەرازوو کە دوو تاکەی پیادامەلواسراوه و پلە پلەکراوه |
| قباء | Jacket = outer-garment | کەوا ، خەفتان ، تاقی ، کورتەك |
| قباب ، قباب | Polyprion | ماسی‌یەکی دەریایی گەورەیە پەرەکەی دڕکاوی‌یە و ڕەنگەکەی قاوەی‌یە وە دەخورێت |
| قبار | | راجع شفلح |
| قبار | lustre | شەوچرا ، سۆلەچرا ، شۆلەچرا ، چۆلەچرا، بلێسە، گڕ، سولە |
| قبار ، كبرشائك، اصف | Caper tree = caper bush | شیفەلەتەی دڕکاوی ، جۆرێکە لە شیقەلەتە گولەکەی گەورە و پومەیی‌یە ، بەرەکەی لە خەیار دەچێت ، گول و بەرەکەی دەکرێنە ترشیاتەوه و ڕەگەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بۆ دەرمانی میزکردن باشە |
| قباح | Bear (old) | ورچی پیر - ورچەکۆن |
| قباع ، قنفذ | Hedgehog | ژیشك ، ژیژك ، ژوژو |
| قباع ، قبع ،فار البوحي | Canerat | مشکی قامیشەلان |
| قباع ، صوت الخنزير | Sound of pig | دەنگی بەراز |
| قباع ، نزع | Bulbous meadow grass = sinal meadow grass = hedgehog grass, Bulbous blue grass | نزا، نانەشوانە ، نانی شڤانی ، کەرخنکێنەر |
| قباق | Vegetable-marrow | کولەکە ، کودی ، کولند ، کوندی |
| قبالة - توليد | mid wifery = tietology = obstetrics = tocology | مامانی ، داپیرکی ، مامانیزانی - هونەری مامانی |
| قبان | Steel-yard = Platform scale | قەپان ، ئامرازێکە بۆ کێشانی شتومەك بەکاردێت |
| قبان حلزوني | Spiral steelyard | قەپانی زەمبەلەکی ، قەپانی پێچاوپێچ ، قەپانی سپرنگدار |
| قباوات | Rennet | کیسەی شیلاوگ و ڕێخۆلە |
| قبلي | Gibli | بایەکی ناوچەی گەرمی خولاوی‌یە لە باکووری ئەفەریقادا هەڵ دەکات |
| قبب | Cordy | ( کوردیلین) گیایەکی دەشتەکی و ڕازاندنەوەیە لە کۆمەڵەی زەمەقە ، ڕەگەکەی ئەستووه گولەکەی بچووك و سپی‌یە یان لەیلاقیە |
| قبة ( للبناية) | Dome Cupola | گومەز ، گومبەتە ، گومبەت ، قۆقزی ، تەنورێکە بۆ تواندنەوەی کانزاکان |
| قبة ( لعهر المعادن) | | |
| قبة ، حفث (للمعدة) | Third stomach of ruminants = manyplies = omasum | هەزار لۆغانە ، بەشی سی‌یەم لە گەدەی گیاندارە کاوێژکەرەکان |
| قبة الفرج ، عانة | Pubes = pubic region | بەر ، بانەگا ، بەری ئافرەت |
| قبة الثوب = طوقه | Collar = neck band | یەخە ، یەخەی کراس |
| قبة السماء = قبة سماوية | The sky = celestial sphere | ئاسمان - گومەزی ئاسمان : خڕۆکێکی فراوانی وەهمی‌یە ، ئێمە وا تصور دەکەین کەواین لە چەقەکەیدا ، کۆمەلێك لە تەنە ئاسمانی‌یە هەمە جۆرەکانی تێدایە |

| | | |
|---|---|---|
| قبج ، حجل رومي ، حجل عراقي ، شنار ، يعقوب | Sand partridge = bo chukar partridge = starne = red leg partridge = rock partridge | کەو ، ژەرەژ ، باڵندەیەکە لە سوێسکە دەچێت ، کێوی ڕەنگ خوڵەمێشی دەنووک و قاچ سووری دەنگ خۆشە لە ناوچەی گەرد و شاخەکانی کوردستاندا دەژی |
| قبج بري = كديري | Pin-tailed = sand grouse | کەودەری ، باڵندەیەکە لە کەو دەچێت بە قەدەر قەلەمونێك دەبێت ڕەنگەکەی مەیلەو خۆڵەمێشییە لە چیا بەرزەکاندا دەژی |
| قبح - قباحة | Ugliness | دزێو ، ناشرینی ، بەد چارەتی ، کرێتی ، بەد سەکوتی ، بەدفە سالی ، ڕەزاقورس ، ئێسك قورس ، ئێسك گرانی |
| قبر مدفن | Grave = tomb | گۆڕ ، گڵکۆ ، ئارامگە ، قەبر ، قەور |
| قبر رمزي ، قبر الجندي المجهول = قبر تذكاري | Cenotaph | گۆڕی یادگار ، گۆڕی سەربازی نەناسراو ، بینایەکە بۆ ئەو سەربازە نەناسراوانەی کە لە جەنگدا شەهید دەکرێن |
| قبرة ، قنبرة = علعل | sted lark | کلاوەکورە ، کولاوەکور ، قازەلاخ ، پۆپنەکی سوفیلکە ، سوفەقێتە ، سوفییە قیتە ، شوان قەلەتێکە لە کۆمەڵەی چۆلەکەیە. |
| قبرة المروج | Meadow lark | کلاوکورەی مێرگ - جۆرێکە لە ڕیشۆڵە . |
| قبرية ، قنبر | Corgdalis | گیایەکی دەشتەکی و ڕازاندنەوەیە لە کۆمەڵەی خاشخاش ، گەلاکەی پەلکدارە گوڵەکەی شێوەی هێشوەکی پەمەییە یان ئاڵتونییە |
| قبرية | Epitaph | نوسینی سەرکێلی گۆڕ |
| قبس ، قبس | Brand = firebrand = live coal | پزیسکی ئاگر ، پزیشکی ئاگر ، چریسك ، چاووگی ئاگر ، دەستەچیلە |
| قبس - فلوكس | phlox | ( فلوکس) جۆرە ڕووەکێکی گوڵدارە |
| قبس | Polemonium | ( پولیمونیۆم) گیایەکی دەشتەکی کشتوکاڵییە ، گوڵەکەی شێوەی هێشوی دوو ڕەنگە شین و زەرد یان شین و سپی |
| قبص ، قرص | Pinch | نقورچ ، قورنجیك |
| قبص ، قرية النحل | | شارەمێرووله |
| قبض ، مسك | Grasping = holding = grip | گرتن ، وەرگرتن |
| قبض ، تقلص | Shrinking = contraction | کرژبوون |
| قبض البطن ، امساك | Constipation = opplIation | گیری ، گرفتی ، قەبزی |
| قبضة ، ملىء الكف | Handful = Manipulus | مشت ، لوێچ ، چینك ، سیخورمە ، قەمچ |
| قبضة ، مقبض | Handle = shaft | دەسك ، دەستك |
| قبضة = السيف و الخنجر | Hilt-half = sapre handle | دەسکی شیر و خەنجەر |
| قبضة البندقية | Hand of grip | دەسکی تفەنگ |
| قبضة اليد ، جمع اليد | Fist = kobushi | مستەکوڵە ، کوڵەمست ، سیخورمە ،قەمچ |
| قبض | Dematochelys | جۆرە کیسەڵێکی زۆر گەورەیە نزیکەی دوو مەتر درێژە و (٦٠٠) کیلۆ دەکێشێت |
| قبضان = دلاع | Strombus Lambis | جۆرێکە لە شەیتانۆکەی ( حلزون) گەورەو ووشك دەکرێتەوە بۆنی خۆشی لێدەردەهێنرێت |
| قبطان | Captain | ( کاپتن) پلەیەکی سەربازییە |

| | | |
|---|---|---|
| قبع البناء = فاسة صغيرة | Scabbling Hummer | تەشۆی بچووك بۆ بەنایی |
| قبع = بوق | Bugle = Trumpet | زورنا |
| قبع | Togrunt = toyeil = shout | مقواندن ، وەكو دەنگی بەراز و فیل و ژیشك |
| قبعة | Cap | كلاو ، تەقیلە ، تەقلە ، كەلارە ، شەبقە ، كولاف ، تەپلە |
| قبعة البولو | Polo cap | شەپقەی یاری پۆلۆ : یارییەكە لە هۆكی دەچێت لەسەر پشتی ئەسپ دەكرێت ، بە گۆچان و تۆپ |
| قبعة ، برنيطة | Hat | شەپقەیەك لێواری هەبێت |
| قبعة بولر | Bowler hat | شەپقەی بۆلە : شەپقەیەكی خڕی ڕەشە |
| قبعة | Petasite | گیایەكە گەڵاكەی لە گورچیلە دەچێت گوڵەكەی بنەوشەیی و بۆن خۆشە |
| قبعة الركبة - واقي الركبة | Keen pad | كڵاوێكە دەكرێتە ئەژنۆوە بۆ پاراستنی |
| قبعة الطفل | | قۆچكە ، كڵاوێكە دەكرێتە سەری منداڵی ساوا |
| قبعة مخروطية | | قۆچكە |
| قبعة صوفية، قبعة الشمس | helmet | كڵاو خوری، جۆرە شەبقەیەكە لە خوری دروست دەكرێت لەبەر هەتاو ، وەرزێر لەسەری دەكات لەكاتی درەوكردندا |
| قبعة ضد المطر | Sov wester | كڵاوی باران = شەپقەی باران : كڵاوێكە قەراغەكەی پانە و دژی باران بەكاردێت |
| قبقاب | Clog = Sabo = Wooden Clogs | كەوشە دارینە ، قاپقاپ |
| قبقاب الثلج | Saowshoe | لیان ، قاپقاپی بەفر : جۆرێكە لە قاپقاپ بۆ بەسەر بەفر ڕۆیشتندا بەكاردێت |
| قبقاب الانزلاق او التزلج | Roller-skate = Ski = Skates | قاپقاپی خلسكێنە |
| قبل - حول | Squint | خێلی ، بە هۆی ئیفلیجی یەك لەو ماسولكانەدا كە چاو دەجولێنێت ، خێلی بۆ دیوی ناوەوە |
| قبل | Externalla | ئەندامە دەركییەكانی كۆئەندامی زاووزێ |
| قبل ، امام | Before | پێش ، بەراهی |
| قبل الاحتظار | preagonal= kitlah | بەرلە گیانەلا |
| قبلة المصلي | Prayer niche | قبیلە ، ڕۆگە |
| قبلة ، لثمة ، بوسة | A kiss | ماچ ، مۆچ |
| قبلة الحياة | Life kiss | ماچی ژیان |
| قبلة مائية | Hydrocele | بلقێكی زەرد - پەیدابوونی بلقێك لەسەر پێستی گون شلەیەكی زەردی ڕوونی كالی تیایە |
| قبل - بدء ، مقدم = امام = سلف - سابق | Pre- Pro- | دوو پێشگرن بە مانای ( پێش - سەرەتا ) |
| قبل الموت | Ante mortem | سەرەمەرگ - پێش مردن |
| قبل الولادة | Antenatal | پێش لە دایك بوون |
| قبلي ، جنوبي | Sauthern | باشووری |
| قبو | Vault fornix = Anarched ceiling | ١. سەربانێك كە بە عەگادە كرابێت. ٢. ساردلو ٣. تاق . ٤. چەمانەوەیەك |

| | | |
|---|---|---|
| قبو صغيرة - قبوة - سرب | A small-Vault | گەنجینە ، سارداو ، عەمار، سەرداب |
| قبوات - سقيط | Pluck = Harset | هەناو و سەرپێچکەی ئاژەڵ وەکو دڵ و سپڵ و ڕەگ و سەرویێ |
| قبول | Acceptance | ڕازی بوون |
| قبول - ريح الصبا | Easterlywind | بای سەبا |
| قبوط ، جراد ، جندب | Grasshopper | کوللە ، کولی ، جۆرێکە لە کوللە، قاچی و شاخەکانی ( قوچەکانی) زۆر درێژن ، ڕەنگەکەی قاوەیی یان سەوزە |
| قبوضية ، امساك | constipation Astringency | گرفت ، گیری ، قەبزی |
| قبيح ، قبيح المنظر | Ugly = Bad looking | بە ئـوك ، کرێـت، دزیـو، ناشـرین ، دەعـەجانی ، بـەدچاو، بەدسـەکوت، بەفەسال |
| قبيب | Hay | کا - گرزە - ئەو گیایەی کە بۆ لەوەڕ هەڵدەگیرێ |
| قبيط | Asiatic Pea-cock | جۆرە باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی کەڵەشێرەکێوی ـ چۆرپۆر لە تاوس دەچێت لە بیشەلانی هیندی چینی دەژی پەری بەسەرەوەیە هەمەڕەنگە ڕەنگی سەوز و گەنمی تێدایە |
| قبيعة = خنزير غينيا | Gvineapig | بـەرازی غنیـا= گیـاندارێکی شـیردەری بچووکـە لـە کەروێشـك دەچێـت تاقیکردنەوەی زانستییانەی لەسەر دەکرێت |
| قبيلة ( في الاحياء) | Phylum | لق ( لە پۆلێن کردنی گیاندار و ڕووەکدا) |
| قبيلة ، عشيرة | Tribe | خێڵ ، تیل ، هۆز ، تێل ، تیرەیەکی گەورە ، تایەفە |
| قتب | Bowel = Cut | ڕیخۆڵە |
| قتب ، اكاف ، برذعة = رحل | Pack- Saddle | کولۆ ، بار ، تروتفاقی کۆیان ، کۆیان ،زین |
| قثة ، قثاء ، فقوس | Snake Cucumber Cucumber | ترۆزی ، بەرێکە لە کۆمەڵەی خەیار دەخورێت |
| قتع ، حفار الساق | Wood-Leopard | مێروویەکی سپی مەیلەوخاکی یان قاوەییە ، لق و قەدی درەخت کون دەکات و پەکی دەخات بە تایبەتی لە درەختی میوەدا |
| قت = قضب | Lucerne = Alfalfa-Medick = Purple medick | سێپەرە ، گیایەکی دەشتەکییە گەڵاکەی سێ‌پەلکە گوڵەکەی شینە یان پەمەیی بۆ مەبەستی لەوەڕگا بەکاردێت |
| قت بري | Wild Lucerne | سێپەرە کێویلە = شیکایزە = کادێك |
| قتاد ، قتات ، قتاد الصمغ ، قرينة - قريجة | Thornbush | کەتیرە ، گەروون ، جەباری ، جونی |
| قداد ، كثيراء ، اسطر غالوس ، مخلب العقاب ، عنزروت ، شجرة القدس ، حلوسيا | Gumtree astragalus tragacanth | کەتیرە، دەوەنێکی دڕکاوی دەشتەکییە گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویەکی سپی یان زەرد یـان بنەوشـەیی یـان سـوورە بـۆ مەبەسـتی پزیشـکی یـان دەرهێنانی کەتیرە بەکار دێت نزیکەی(٤٠) جۆری هەیە |
| قتال | Fight = Combat | کوشتار ، شەڕ ، جەنگ |
| قتال ، قاتل | Killer | کوژەر ، پیاوکوژ ، خوێنڕێژ ، بکوژ ، کوشندە |
| قتام ، ظلام | Darkness = Dimness = Gloom | تاریکی |
| قتامين | Melanin | ( میلانین) ڕەنگێکە قژی پێ ڕەش دەکرێت ڕەنگی ڕەشە |
| قتار | Emanation | توخمـی دەسـکەوت یەکێکـە لـەو مـادە گازییـە تیشـکدەرەوانەی کـە لـە ئەنجامی وورد و خاش بوونی ڕادیۆمەوە پەیدا دەبێت وەکو ( رادۆن) |

| | | |
|---|---|---|
| قتل | Killing = Slaughtering | كوشتن |
| قاتل الذات ، انتحار | Self-murder = Suicide | خۆكوشتن |
| قتل خطاء | Manslaughter | كوشتن به هه‌ڵه |
| قتل عمداً | Murder | كوشتنی به ئه‌نقه‌ست |
| قتل الجنين = قتل الحميل | Feticide, foeticide | كوشتنی كۆرپه‌له |
| قسم = ميرسين | Myrsine | ( میرسین) = دارو ده‌وه‌نێكی ناوچه گه‌رمه‌كانه گوڵه‌كه‌ی ورده ، به‌ری هه‌ندێك جۆری ده‌خورێت |
| قتل الحصان بسبب العجز او الاصابة | Putdown | كوشتنی ئه‌سپ به هۆی په‌ككه‌وتنی یان نه‌خۆشی‌یه‌وه |
| قتم ، عجاج | Dust | ته‌پوتۆز |
| قتمة = ظلام | Darkness | تاریكی |
| قتن | Gerres | جۆره ماسی‌یه‌كی پانی قوپاوه به قه‌ده‌ر له‌پی‌ده‌ست ده‌بێت |
| قتون | Pteroptus | جۆره گه‌نه‌یه‌كی بچووكی شێوه‌ی هێلكه‌یی ره‌نگی زه‌رده له له‌شی باڵنده‌دا ده‌ژی |
| قتيل | Killed | كوژراو |
| قتير ، مسمار بطاسة | Stud = Spike | كلێپس ، بزماری كلێپس |
| قثاء ، قثي = مقثي ، فقوس ، قشعر = قثاء ملتوية = خيار ترعوزي | Gherkin | ترۆزی گیایه‌كی كشتوكاڵی‌یه له كۆمه‌ڵه‌ی كوله‌كه‌یه و به‌ره‌كه‌ی لوله‌یی‌یه ره‌نگه‌كه‌ی سه‌وزه یان زه‌رده و تامی له تامی خه‌یار ده‌چێت |
| قثاء = قثد = خيار الماء | Cucumber | خه‌یار ، ئاروو |
| قثاء = قورة = زراوند | Birthwort= Aristolochia = | مارسكه - گیاێنروو - خه‌یاره مارانی. |
| قثاء البحر ، خيار البحر ، ذب البحر | Sea Cucumber | خه‌یاری ده‌ریا گیانداره‌كی ده‌ریای‌یه له خه‌یار ده‌چێت ده‌مه‌كه‌ی نزیكه‌ی (١٦-٢٠) په‌لی هه‌ست كردنی پێوه‌یه ، گه‌لێك جۆری هه‌یه هه‌ندێكی ده‌خورێت |
| قثاء ديمي | | خه‌یاری دێمی ، قه‌تك |
| قثاء الحمار ، قثاء بري ، اطريون | Elaterium = Wild-Cucmber = Ecbale = Squirting-Cucumber | خه‌یار كیویله ، خه‌یار كه‌رانه ، شه‌رواڵ به كوڵ : رووه‌كێكه به‌ره‌كه‌ی سه‌وز و تووكنن ، تاڵ و ره‌وانكه‌ره به قه‌ده‌ر هێلكه‌یه‌كی قاز ده‌بێت ژه‌هره ئاوه‌كه‌ی ماده‌یه‌كی ره‌وانكه‌ری لێ ده‌رده‌هێنرێت كه پێده‌گات له رووه‌كه‌كه ده‌رنه‌په‌رێت و ده‌ته‌قێت تۆوه‌كه‌ی بڵاوده‌كاته‌وه و ئه‌م گیایه له كۆمه‌ڵه‌ی كوله‌كه‌ن ، گه‌ڵاكه‌ی له گه‌ڵای خه‌یار ده‌چێت ، كه‌ر حه‌زبه خواردنی ده‌كات ، به‌ره‌كه‌ی ده‌رمانی لێده‌رده‌هێنرێت بۆ چاره‌سه‌ركردنی نه‌خۆشی گیاندار به‌كاردێت |
| قثائ النعام = مرارة الصحاري = حدج = صنطل = علقم | Colocynth, bitterapple, bitter-gourd | خه‌یار چه‌مه‌ر : رووه‌كێكه ده‌نكه‌كه‌ی بۆ چاوئێشه به‌كارده‌هێنرێت |
| قثاء هندي= خيار شنبر | Pudding pipe coffee, Indian laburnum | خه‌یار چه‌مه‌ر، رووه‌كێكه ده‌نكه‌كه‌ی بۆ چاوئێشه به‌كارده‌هێنرێت. |
| قثاء ناضج | riped cucumber | كالیار ، ترۆزی‌یه‌كی گه‌وره‌ی پێگه‌یشتووه تامه‌كه‌ی ترش و شیرینه |

| | | |
|---|---|---|
| قثاء ثعبانية | Snake-gourd, serpent-gourd, viper gourd | كولەکە مارانە : جۆرێکە لە کولەکە ، گیایەکە گەڵاکەی ( ٣-٥) پەلکی هەیە گوڵەکەی سپییە ، بەرەکەی لوولەیی و پێچاوپێچە ڕەنگەکەی لە پێشدا سەوزە کە پێ‌دەگات دەبێت بە زەردی مەیلە و پرتەقاڵی بەرەکەی دەکرێ بە چێشت |
| قثاءيات | | ئارووییەکان، کۆمەڵە رووەکێکە وەکو خەیار و ترۆزییە |
| قثار - لوة ،صبر ، - صمغ المر - عودرطب - عود البخور - الوه - النجوج - عود الطيب - يلنجوج | Aloe | داری عوود - مادەیەکی بۆن خۆشە لە بۆنەکاندا دەسوتێنرێت |
| قثعب | Lixus | ( لیکسەس) جۆرە مێروویەکی قرتێنەری کونکەرە لەشەکەی لاکێشەیی و باریکە ڕەنگەکەی ڕەش یان قاوەیی یان گەنمی لە قەدی ڕووەکدا دەژی و زیانی پێ‌دەبەخشێت |
| قجاج - بغروس شائع | Braize = porgy | ماسییەکی دەریایی پەرەکە دڕکاوییە شێوەکەی هێلکەییە ڕەنگی پەمەیی یان پەمەیی مەیلە و پرتەقاڵییە ، ژێرسکی زیوییە ، گۆشتەکەی خۆشە |
| قحال - ضوي - هزال تدريجي | Marasmus | نەخۆشییەکە تووشی مەڕومالآت دەبێت وە پێستەکەیان ووشك دەبێـەوە بەرەبەرە لاوازدەبن |
| قحاب | Coughing of Horses | کۆکەی وولآخ |
| ١قحاز | Coughing of Camels | کۆکەی ووشتر |
| قحاف ، سيل جارف | Sweeping-torrent | لافاوە ، سولآو |
| قحبة ، فاجرة - مومسة - زانية | Awhore= Harlot = Prostitute = Strumpet | قەحبە ، سۆزانی ، ئافرەتی داوێن پیس ، ئافرەتی خراپ |
| قح | Pure = Real | پەتی ، خالیە ، پاك |
| قحط ، مجاعة | Drought = Aridity = Famine = Dearth | قات و قڕی ، نەبوونی ، قاتی ، قاتو قڕ، بێ‌دەرامەتی ، نەهاتی ، نامەد ، خەلآ - بێ‌بارانی |
| قحط | Floating arum | گیایەکی دەشتەکییە لە کۆمەڵەی سێوی بن ئەرزە |
| قحف الرأس - صاقورة | Brain pan, Skull = Calvarium Cranium | کاسەی سەر ، هەست ئێسکی بچووکی تەنکن لێوارەکانیشیان ددانەدارن وەکو ددانی مشار بە یەکتریدا چوون سنوقێکی ئێسکییان لێ‌پەیدابووە بۆ پاراستنی مێشك |
| قحل ، قحولة ، يبوسة | Aridity = Dryness | ووشکانی - ووشك و برنگی |
| قحل ، قاحل | Dry , Arid = Droughty | ووشك |
| قحوان ، اقحوان ، قحوان اصفر، بابونج | Daisy = Camomile | بەیبون - بەیبونی زەرد |
| قحول- ضوي | Marasmus | لاوازبوون بە شێنەیی. |
| قد | Short-spined = Bull-head = Cod = Collus = Father-lasher | ( کۆد) جۆرە ماسییەکی بچووکی سەرزل پەرەکە دڕکاوییە لە ڕووبار و دەریاشدا دەژی گۆشتەکەی زۆر خۆش نییە هەندێکی بۆنێکی ناخۆشی هەیە |
| قدا | Aroma | بۆنی خۆش |
| قداح | Flowers of orange tree | قەدەح ، گوڵی پرتەقاڵی و لیمۆ و نارنج ، بۆنەکەی زۆر خۆشە |
| قداح ، قداحة - مقدحة | Flint | بەردەئەستێ |

| | | |
|---|---|---|
| قداحة ، مقدحة | Steel | چەخماخ ئەستێ ، ئەو پارچە پۆلایەی کە لەبەردە ئەستێ دەدرێت بۆ ئاگرکردنەوە |
| قداحة | Detonator | چەخماخ = چەخکاخی تەقاندنی تەقەمەنی |
| قداحة ، ولاعة السجاير | Cigarette-lighter | چەخماخ ، بۆ جگەرە داگیرساندن . پەلەپیتکە ، پیلکە ، چەخماخ، چەرخ ، ئەستێ ، تیزە ، قوتویەکی بچووکە بەنزین و بەرد و پلیتە و چەرخێکی تیایە ئاگری پێ دەکرێتەوە |
| قداد - مغص | Colic = Tormina | سك ئێشە ، ژانە سك |
| قداد | | راجع ( قتاد) |
| قداد | Cricetus | (کریسیتەی) گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە کۆمەڵەی مشك سەری قوچەکیە ، رەنگی هەمەجۆری هەیە |
| قداد - هامستر | Hamster | ( هامستەر) گیاندارێکە رەنگەکەی مەیلەو زەردە ، لەسۆزی سپییە ناوچەوانی هێڵی رەشی تیادایە رووەتی زەردە ملی قاوەیی مەیلەو سوورە لە ئەوروپا دەژی . لەژێر زەویدا قومۆش لی‌دەدات و کون و کەلەبەری دووروودرێژ دروست دەکات و دانەویڵەی تێدا کۆدەکاتەوە |
| قداف - قخاريات | Crocker | گۆزە ، دیزە و گۆزە |
| قدام | Before | پێشەوە |
| قدان ، دقة | | جۆرە میوویەکی زیان بەخشە بە رووەك |
| قدة - شفة | Lip | لچ . لێو. |
| قدة خشبية ، شريحة خشبية | Lath | توێژاڵی تەختە ، تەبەقی تەختەی تەنك |
| قدح ، كاس | Glass Tumbler | پەرداخ ، کاسە ، جام |
| قدح زجاجي پايركس | Beaker Pyrex | پەرداخی ( کاسەی = جامی) پایرێکس ، پەرداخێکی شوشەییە بەرگەی گەرمی دەگرێت |
| قدح الشاي | Drinking cup | پیاڵە ، ئیستیکان |
| قدح نبيذ | Wineglass | پەرداخی مەی |
| قدح | Decay of teeth | رەشبوونی ددان ، کلۆربوونی ددان. |
| قدح | Goblet = vase | جۆرێکە لە هەڵپاچینی درەخت |
| قد - سمك القد | Bull head Ling = Codfish = Cottus | کۆد - جۆرە ماسی‌یەکە لە ئەمەنگ دەچێت ووشك دەکرێتەوە و دەخورێت یان رۆنی ماسی لێ دەردەهێنرێت درێژییەکەی نزیکەی ٢٥سم و رەنگەکەی سوور یان قاوەیی‌یە و ڤیتامین A یشی تێدایە |
| قد | Cutting | لەت کردن ، کوت کردن |
| قد ، قوام ، قامة | Figure = Stature | قەد ، بالآ ، بەژن |
| قد | Strap = Thong | قامیش ، پشتێنی چەرم |
| قدە | Slat | توێژاڵی تەختە و کانزا |
| قدر - كمية | Quantity = Amount | هەند ، بڕ |
| قدر ضوئي | Magnitude | هەندێ رووناکی - بڕی درەوشانەوە - پلەی ( بڕی) درەوشانەوە واتا بریسکانەوەی ئەستێرە پێوانەیە بۆ رادەی رێژەی بریسکانەوەی ئەستێرەکان |
| قدر | Cooking pot = Casserole = Earthen-ware Cooking pot | مەنجەڵ ، قوشقانە ، قازان ، قازانك |

| | | |
|---|---|---|
| قدرة ، وعاء فخاري | Earthen Ware Jug | مەنجەڵێکی گڵێنە ، دیزە ، کوپە |
| قدر ضوئي | Magnitude | بڕی ڕووناکی - پلەی بریسکانەوەی ئەستێرە |
| قدر ضوئي ظاهري | Apparent Magnitude | بڕی درەوشانەوەی دیار - هەندێ ڕووناکی دیـار = پلـەی بریسـکانەوەی ئەستێرە وەکو لە ئێمەوە دیارە واتە وەکو ئەوەی کە ئێمە بەچاو ئەیبینین |
| قدر ضوئي مطلق<br>قدر ضوئي حقيقي | Absolute-Magnitude | بڕی درەوشانەوەی بەتی ( ڕاستەقینە) - بڕی ئەو بریسکانەوەیەی کە بە ڕاستی ئەستێرەکە دەیداتەوە |
| قدرة | Strength = Force = Power = Ability | هێز ، توانا ، توانست ، توانایی ، خورتی ، یارایی، دەرەقـەت ، توانـین = هێزێکی جوولێنەر |
| قدرة حصان | Horse Power | توانای ( هێزی ) ئەسپ ، یەکەیەکی ئیش یان کارەبایە دەکاتە ( ٥٥٠ پێ) رەتڵ لە چرکەیەکدا یان ٧٤٦وات |
| قدرة كهربائية | Electric Power | توانای کارەبایی ، توانستی کارەبا<br>ئـەنجامی لێکدانـی تـەوژمی کارەبـایی ( بـە ئـەمپێر) لـە هـێزی پاڵنـەری کارەبایی ( بە ڤۆڵت) وەکو کیلۆوات |
| قدرة الشمعة | Candle Power | توانای مۆم : یەکەیەکە بۆ پێوانی تینی ڕووناکی و سـەرچاوەکانی تـری ڕووناکی دانەوە توانای گلۆپێکی کارەبایی(٦) واتی پەنجا ئەوەندی تینی ڕووناکی مۆمێکە |
| قدر كاتم = قدر الضغط | | مەنجەڵی هەڵم ، مەنجەڵی بوخار - مەنجەڵێکە خواردەمەنی بەکاری هەڵم لێ دەنێت |
| قدر كبير، دست | Big Cooking pot | قازان ، قازانگ ، تیان ، تیانە ، مەنجەڵی زنجیردار |
| قدر صغير | Small Cooking Pot | قابلەمە ، قاولەمە ، مەنجەڵی بچووک ، مەنجەڵۆکە ، تیانچە |
| قد صورة | Kadsura | ( کادسورە) دەوەنێکی دەشتەکی و ڕازاندنەوەیە گوڵەکەی سپییە هێڵـی زەردی تیایـە بەرەکـەی سـوورە قـەد و گەڵاکـەی بـۆ دروسـت کردنـی کاغـەز بەکاردێت |
| قدرة جنسية = رغبة جنسية | Lustihood | توانای ڕەگەزیی ، ئالوشی ڕەگەزی |
| قدرة كهرمائية | Hydroelectric power | توانای ( هێزی) کارۆئاوی ئەو کارەبایەیە کە بە تۆربینی ئاوی تاڤگە پەیدا دەبێت |
| قدر العمالقة - نقر | Potholes | مەنجەڵی چەتوەڵەکان ، چاڵێکە لەکەڤری ژێر تاڤگەکاندا پەیدا دەبێت بە زەبری ئاوەکە |
| قدقود ، شيم | Caranx | ( کاراناکس) جۆرە ماسییەکی دەریای لاکێشەییە گۆشتەکەی خۆشە |
| قدم - رجل | Foot, Pes = podiom | پێ |
| قدم رطل | Foot-pound | پێ - باوند = یەکەی ئەو ئیشەی کە لە ئەنجامی جووڵانی تەنێکەوە پەیدا دەبێت بەهێزی پاوندێك |
| قدم انبوبية | Ambulgcral foot = Tube foot | پێی لوولەیی = : ئەندامێکە لە گیانداری ئەستێرەی دەریادا هەیە |
| قدمة العمود | Base of Column | پلەی کۆڵەکە ، سەکۆی ژێر پایە و کۆڵەکە |
| قدم مخلبية ، قدم ملقطية | Claw foot | پێی چڕنوکی - پێی چڕنوکدار<br>پێی مەقاشی ، پێی ماشەیی ، وەکو لە هەندێك گیاندار دا هەیە |
| قدم الدب | | ڕووەکێکی پزیشکییەو دەرمانە بۆ نەخۆشی سیل |
| قدمة | Callipers = Caliper | کالیپەر - ئامرازێکی بچووکە لەوەرنیە دەچێت بۆ پێوانی ماوە یان تیرە یان ئەستووری یان درێژی |

| | | |
|---|---|---|
| قدمة = ورنيه | Vernier | وەرنیە ، ئامرازێکە بۆ پێوانی ئەستووری شتومەك بەکاردێت |
| قدمة | English Scale | ڕاستەیەکە یەکەی درێژی ئینگلیزی پلەپلەکراوە |
| قدم - قدمي | Podo, ped- | پێ = پێی - پێشگرێکە |
| قدم - شمعة | Foot Candle | پێ - مۆم ڕووناکی دانەوە ، ڕوویەك ( سگح) کە بەر ڕووناکی مۆمێك بکەوێت لە دووری یەك پێوە |
| قدم مكعب في الثانية | Cusec | یەك پێی خشتەکی لە چرکەیەکدا |
| قدم مديورا ، مرض القدم الفطري | madunomyco sis-Foot | پێی مادیورا، بەهۆی هەندێ میکرۆبەوە ( کەڕوو) برینێکی خڕی بێ هەست لەسەر پێ پەیدا دەبێت وە لە دوایدا بلۆق پەیدادەکات و خوێن و کێمی لێدێت وە پێدەئاوسێ و دادەڕزێت |
| قدم خمصاء | Hollow foot | پێی کەوانەیی |
| قدم وكعاء | | قاچێك کە پاژنەکەی خورابێت |
| قدم حنفاء | Club Foot | قاچێك کە بە زگماکی نارێك بێت |
| قدم رحاء - قدم روحاء | Flatfoot = Splayfoot | پێی پان ، پێ تەخت ، پێیەك بۆشایەکەی ژێرەوەی کەم بێت |
| قدم مكففة | | قاچێك کە پەنجەکانی پێکەوە نوسابێت بە پەردە |
| قدم كاذبة ، قدم وهمية | Pseudo podium | گەندە پێ ، پێدرۆزنە وەکو لە گیانداری ئەمیبادا |
| قدم باوند | Foot-Pound | پێ پاوەند یەکەی پێوانی ئەو ئیشەی کە دەکرێت بۆ بەرزکردنەوەی قورسایی ، پاوەندێك بۆ ماوەی یەك پێ |
| قدم عاثرة | | پەیزەن، پێزەن |
| قدم | Oldness | کۆنی، کەڤنی |
| قدم الرياضي - قدم الاسليت | Athletes-foot | پێی وەرزشەوان: نەخۆشیەکی درمی کەڕوویە پێ بلۆق و خرووی لەگەڵ دایە لە شوێنەکانی وەرزشدا بڵاو دەبێ تەوە وەکو کەچەڵی وایە |
| قدمي | Pedal = Podalic | پێی = هەرشتێك پەیوەندی بەپێ وە هەبێت |
| قدم بعداء | Pes abductus | پێی دوور، لەکاتی ڕۆیشتندا هەردوو پێ لەیەکتریەوە دووربن |
| قدم قرباء | Pes adductus | پێی نزیك - لەکاتی ڕۆیشتندا هەردوو پێ لەیەکتریەوە نزیك بن |
| قدوة | Example = model | نمونە، پێشەنگ |
| قدوم | Coming | هاتن |
| قدوم | Hatchet = Adz = Axe | تەشوێ، تەفشێ، تێشە، تەڤر - تەبەرە، باڵتە تەورێس بۆ بڕینەوەی دارو داتاشین |
| قدوح | Piophila | (پایۆفیلا) جۆرە مێرویەکی قاوەی یە لە مێشولە دەچێت لەسەر ڕۆن و پەنیر دەژی |
| قديد | Fricassee = Dried meat - Cured meat | قاورمە، چروان، گۆشتی سوورەوەکراو |
| قديد اللحم البقري | Charqul | قاورمە، گۆشتی سوورەوەکراو بۆ هەڵگرتن |
| قدي | savoury = Tasty | تام خۆش - بەتام |
| قدير | All powerful | خورت ، توانا ، یارا |
| قديفة ( قماش) | | قەیفە، جۆرێکە لە قوماش. |
| قديم | Old = Ancient | کۆن ، دێرین ، کەڤن |
| قذالي | Occipital | شتێك پەیوەندی هەبێت بە پشتەوەی کەللەسەرەوە |
| قذارة | Ordure = Sordes = Dirtiness | چڵك ، قرێژ ، پۆخڵی، پیسی، چڵێتی، دژوێن، چەپەڵی، چڵکنی |
| قذائف موجهة | Missilery | بۆمبای ئاراستەکراو |

| | | |
|---|---|---|
| قذاه - قذى | Mote = speck | پوشكە ، تەپەوتۆز |
| قذافة الصواريخ | Rocket = Thrower | رووكێت هاوێژ، هاوێژەری رووكێت |
| قذافة | | قۆچەقانی ، بەركاتی، بەردەكانی |
| قذافة - رماثة | Bomber = Brachynous | قالۆنچـە : جـۆرە قالۆنچەیەكـە قالۆنچـەی تـر دەخـوات بـۆ مەبەسـتی خۆپاراستن بۆگەن بەردەداتەوە |
| قذال - قفا | Nape = Poll = occiput | پشت مل ، پاتك، ماوەی نێوان هەردوو گوێچكە لە پشت ملدا |
| قذان | Siphonaptera | جۆرە مێروویەكی بچووكی بێ باڵە لمۆزكەی مژۆكە وەكو كێچ وایە |
| قذر، وسخ | Smot = Dirty | چەپەڵ، پیس، چڵێت، چڵكن، قرێژی گەمار |
| قذع - سب - شتم | Abusing = Cursing | جنێو |
| قذف = ثبق | Emission = Extrusion = Throwing, ejection | هاوییشتن، تێگرتن، تووڕدان، دەرپەڕاندن، فڕێدان، هەڵدان |
| قذف المني | Spermatism | ئاو هاتنەوە، رەحەت بوون، شاوەت هاتنەوە |
| قذف بالقنابل | Bombardment | بۆمباران |
| قذف الثقل | Pulling the shot | قورسایی هاویشتن جۆرە یاری یەكە |
| قذيفة | Missile | هاوێژراو، بۆمبا |
| قذيفة صاروخية | rocket | هاوێژراوی ساروخی، بۆمبای موشەكی |
| قذيفة، قذيف | Projectile | شەنگ، بۆمبای هاوێژراو، پلار، هاوێژراو جۆرە بۆمبایەكی لولەیی‌یە |
| قذيفة كيماوية | Chemical projectile | بۆمبای كیمیایی - هاوێژراوی كیمیایی |
| قذيفة يدوية | Grenade | نارنجۆك، بۆمبای دەستی |
| قذيفة دخان | Smoke projectile | بۆمبای دوكەڵ = هاوێژراوی دووكەڵ |
| قذيفة نووية | | هاوێژراو یا بۆمبای ئەتۆمی |
| قذيفة باليستية = قذيفة ذاتية الدفع | Ballistic-Missile | هاوێژراوی بالیستی = هاوێژراوی خۆپاڵنەر: كەشتی یەكە لەلایەن مرۆڤەوە لێدەخوڕدرێت لەپێشدا دەهاوێژرێت و لە كۆتایدا دەكەوێتە خوارەوە |
| قذيفة موجهة | Guided missile | هاوێژراوی ئاراستە كراو: كە شتی یەكی هەوای‌یە لە خۆیەوە دەردەپەڕێت و مرۆڤی تیادانی‌یە مادەی لەناوبەری تێدایە دەشێت دوای دەرپەڕینەكەی ڕێڕەوەكەی بگۆڕێت |
| قذيفة بركانية | Volcanic-bomb = Pyroclast | بۆمبای گڕكانی - ئەو مادە گڕ گرتوانەی كە لە گڕكانەوە دەهاوێژرێتە دەرەوە. |
| قراه | Endemia = Endemy | نەخۆشی نیشتەجێ |
| قراد ، قرادة | Tick = Mite | گەنـە، قرنـوو، كرنـی، كەوڵـە، كـەوە، مـێ، مێروولەیەكـە لـە كۆمەڵـەی جاڵجاڵۆكەیـە دەنوسـێت بـە پێسـتی ئاژەڵـەوە و خوێنەكـەی دەمژێـت ، هەندێكیان نەخۆشی ( تیندۆس) دەگوێزنەوە |
| قراءة | Reading | خوێندنەوە |
| قراصة | Rasura | خاكە، وورده = وەكو وورده ئاسن |
| قراصة الخشب | | مۆرانەی دار |
| قراز | | جۆرە باڵندەیەكە لە قەلەموون دەچێت ، گەورەیە |
| قرار | Decision = Ruling | بڕیار، وەكو بڕیاری دادوەر |
| قرارة | Deposit | ١. مادەی نیشتەنی بەكاری یا یان ئاو یان سەهۆڵ.<br>٢. نیشتنی مادەكان بە كارەبا |

| | | |
|---|---|---|
| قرء = ودق - دورة نزوية | Heats = Duration of the rut | خولی بەتەڵەیی = خولی فانی - ماوەی ڕۆژانی ئالوش ڕەگەزیی لە مێی گیانداری وەکو ماین و مانگا و مەڕ |
| قراع | Dermatomycosis | نەخۆشییەکی پێستییە لە گەنەوە دەبێت |
| قراع عسلي = قراع بلدي | Favus = Scall | جۆرە کەچەڵییەکە تووشی سەرەدبێ و دوومەڵێکی زەردی بۆگەن پەیدا دەکات |
| قراع ، نقار، ناقوبة | Wood Pecker | دارکونکەرە: جۆرە باڵندەیەکە دەنووك لە قەدی درەخت دەدات و کرمی لێدەردەهێنێت و دەیخوات |
| قراصيا، قراسيا، كرزبري | Cerasifera = Prunus Cherry-Plum = Cerasus = Bilaluk | ئالوبالو ، بەلاڵوك : درەختێکە بەرێکی بچووکی زەرد یان بنەوشەیی مەیلە و ڕەشی هەیە ، بەرەکەی شیرین و تفتە بۆ ڕەوانی باشە، هەندێك جار ووشك دەکرێتەوە دەکرێتە قووتووەوە |
| قربي = مستوطن | Enolemic | نیشتەجێ : بە تایبەتی نەخۆشی نیشتەجێ |
| قرار الجرب | Symbiote | گەنەی گەڕیی- جۆرێکە لە گەنە دەبێتە هۆی گەڕی لە وولاخ و ئاژەڵدا |
| قراد الطيور | Argas - persicus | چنگینە - جۆرێکە لە گەنە لە باڵندە دەدات و دەیکوژێت |
| قرار قاع | Bottom = Fathom | بن = ناخ وەکو بنی دەریا |
| قراصنة حديد | Scrapiron | ووردەئاسن |
| قرابة | Relationship | خزمایەتی |
| قراءة الكف | Palmistry = Chiromancy | دەست گرتنەوە - دەست خوێندنەوە |
| قراح - رائق | Limpid | ڕوون = وەکو ئاوێکی ڕوون |
| قران = تقرن | Keratosis | وشك هەڵهاتن ، وەکو لە مادەی نینۆك و شاخ و سمی وولاخدا |
| قرافة، قرف | Bark | توێکڵی قەدی درەخت |
| قراب بيض = كيس البيض | Ovaric sheath | تورەکەی گەرا= وەکو لە مێرووی مێدا |
| قرارة | Base, station | بنکە ، بنقەرەنگ |
| قراءة الكف | | دەست گرتنەوە |
| قراطة | Curra - tow plant | گیایەکی دەشتەکی کشتوکاڵییە ، گەڵاکەی گوشتن و ڕیشاڵییە قەراغەکەی دڕکاوییە ، گوڵەکەی جوانە بەرەکەی بچووکە پێی دەوترێت (لیمۆی زەوی) چونکە تفتە وە لەناو زەویدا پێدەگات |
| قرابة - دمجانة | Carboy = Demijohn | قەرابە بۆتڵی گەورە - وەکو قەرابەی ئارەق |
| قراطيا | Mesquit, algarroba | خرنوك ، خرنیفك ، گیایەکی دڕکاوییە ئاژەڵ حەز بە خواردنی دەکات. |
| قراد لامع | | گەنە ، بریسکەدار، جۆرێکە لە گەنە نەخشۆی بلاودەکاتەوە |
| قرانيا، قرنوس | Cornel-tree, cornelian cherry, cornus | کۆرنەس - کۆرنیل= دەوەنێکە گوڵەکەی جوانە ، لە شێوەی چەترێکی هەڵگەڕاوەدایە ، بەرەکەی لە گێلاس دەچێت و لاکێشەییە دەخورێت ڕۆنێك لە تۆوەکەی دەردەهێنرێت بۆ دروست کردنی سابوون بەکاردێت، تەختەکەی ڕەق و نایابە |
| قرانيا | Dogwood | درەختی سەگ - دارسەگ = دارو دەوەنێکی ڕازاندنەوەیە هێشوە گوڵی سپی دەگرێت |
| قراص، قريص نبات النار ، حريق، انجرة | Common-Nettle = Curtical Stinging Nettle | گەزنە، گەزگەزك، گیایەکی دەشتەکی و پزیشکییە ، گەڵاکەی تووی ئەوتۆی پێوەیە کە ئاوێکی سوتێنەر دەردەدات ئەگەر بەرلەشی گیاندار بکەوێت دەیسوتێنێت ، گوڵەکەی سەوزە و تۆوەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بۆ ووریاکردنەوە و زیادکردنی ئارەزووی ڕەگەزی بەکاردێت |
| قراص كاذب = لاميون | Deadnettle = Lamium | (لامیوم) - گەزنە درۆزنە = جۆرێکە لە ڕووەکی گەزنە بەڵام سوتێنەر نییە |

| | | |
|---|---|---|
| قرارة بحرية = رسابة القاع | Pelagic-deposit | نيشتەنی بنی دەریا |
| قراب = كعيس = عليه | Theca | توورەكە ، مەشكە |
| قران - زواج | Marriage = Wedding | ژن هێنان = شوكردن - هاوسەركردن |
| قراص البحر - ميدوزا = مدوس = مدوز | Medusa = Jellyfish | ( ميدۆزا) - گەزنەی دەریان - گیاندارێكی لوولەیی دەریاییە شێوەكەی خڕە و ڕەنگەكەی زەردی كاڵ یان شینە لە كاتی مەترسیدا مادەیەكی سوتێنەر دەگرێتە دوژمن |
| قراص الزينة | | ( پیلیا) گەزنەی ڕازاندنەوە جۆرێكە لە گەزنە گەڵاكەی گەورەیە |
| قراح = قرواح | Ploughed land | زەوی كێڵراو |
| قراقيش | | كولێرەبەڕۆن، ناوساجی |
| قراح | Pure | پاك ، ڕوون وەكو ئاو |
| قراقارا - كركار | Caracara | كاراكارا- هەڵۆیەكە لە باشووری ئەمریكادا دەژی |
| قرام، مانجروف | Mangrove | ( مانگروڤ ) درەختێكی گەورەیە بەرەكەی لە هەرمێ دەچێ و دەخورێت ، مەی لە ئاوكی بەرەكەی دروست دەكرێت |
| قرابة = لحاء | Bark | كەڤ - كەڤین = توێكڵی لق و قەدی درەخت |
| قرب | Nearness | نزیكی ، نزیك، |
| قربة الماء - زق | Ascus = Water Skin | مەشكە ، كوندە، چەوەندە، كوننە، هیزە، خیگە، هەریز، هەمانە، هەوانە، همبان، دەفرێكە لە پێستی ئاژەڵ دروست دەكرێت وە دەباخ دەكرێت و شتومەكی تێدەكرێت |
| قر بينة = غدارة | Short Musket = Carbine | كاربین : تفەنگی بچووك |
| قر بوس ( للسرج) | Saddlebow | قەرەبووز، قەڵبوزی زین، پێشكو، بەركۆ |
| قر بوس السرج الخلفي | Cantle | پاشكۆی زین |
| قر بوس السرج الأمامي | Pommel | پێشكۆی زین |
| قربه الماء الساخن | Hot Water-bottle | لاستێكی ئاوی گەرم |
| قربين | Corbina | كۆربینا، ماسی‌یەكی دەریایی ئەمریكی‌یە |
| قرح تؤلولية | Warty Ulcer | برینی بالووكەیی |
| قرحة سرطانية | Ulcero Cancer | برینی شێرپەنجەیی |
| قرحة صلبة | Hard Ulcer | برینی ڕەق - كولكی ڕەق |
| قرحة لينة | Soft ulcer | برینی نەرم |
| قرحة ( تناسلية) صلبة | Chancre | كولكی زاوزێی ڕەق |
| قره | Chill = Cold | سەرما، ساردی |
| قره العين | Delight of the eye | ڕووناكی چاو، چاو ڕوونی |
| قرة العين - حرف الماء - قرنوش= جرجرالماء | Kress= Cress= Brooklime = Water pimperent Water Cress | كوورزەڵە، بیزەرو، گیایەكی ئاوی‌یە بۆ كرم فڕێدان باشە تامەكەی توونە، كوزەڵەی ئاویی گەڵاكەی لە خاچ ( صليب) دەچێت لەسەر ڕووی ئاو دەژی، گەڵاكەی سێ‌پەلكە گۆلەكەی سپی‌یە، گەڵا و گوڵكەی دەخورێت بۆ تەندروستی باشە |
| قرت الجلد - تقرت الجلد | Keratosis | ئەستووربوون و ڕەق بوونی پێست |
| قرت = كدقة | Ecchymosis | خوێن تێزان= خوێنی مەییو |
| قرحة | Ulcer = Chancre = Sore = Canlxer | برین، زەخم، كولك |

| | | |
|---|---|---|
| قرحة خبيثة | Cachelcoma | تیراویْ، برینێکی پیس |
| قرحة افرنجية | Syphilis | فەرەنگی : نەخۆشییەکی رەگەزییە ( جنسییە). |
| قرحة البرد | Coldsore | تامیسك : زیپکەیەکە لەدەم و چاو دێت |
| قرحة التناسلية لينة | Chancroid | نەخۆشییەکی درمە برین لەسەر ئەندامی زاوزیْ پەیدا دەکات کولکی زاوزیْ (نەرمە) . |
| قرحة المعدة | Gastric Ulcer = Peptic Ulcer | برینی گەدە |
| قرحة الاثني عشرة | Duodenal Ulcer | برینی دوانزە گریْ - کوانی دوانزەگریْ |
| قرحة اكلة = | Rodent Ulcer | برینێکی خۆرە |
| قرحة اكالة | Corrosive Ulcer<br>Phagedenom<br>Phadedenic Chancroid | |
| قرحة شرقية اخت حبة بغداد | Oriental-Sore | کانی خورما ، کوانی خورما: برینێکە بە زۆری لەدەم و چاو دێت کە چاك دەبێتەوە شوێنەکەی چاك نابێتەوە |
| قرحة توتية، بوز | Yaws | برینێکە شێوەی لە توو دەچێت ئازاری نییە بە زۆری لە قاچدا پەیدا دەبێت. |
| قرحة ثاقبة | Perforating-ulcer | برینی کونکەر |
| قرحة الغنم | | نەخۆشییەکی پیسە توشی مەرو مالاْت دەبێت برینی کیمیاوی لەسەر لچ و لێوی پەیدا دەکات |
| قرحي | Ulcerous | کوانی = برینی بریناوی، شتێك پەوەندی بە برینەوە هەبێت |
| قرد = سعدان، سناس | Ape= Drill | مەیمون = گیاندارێکی شیردەرە لە کۆمەڵەی مرۆڤە |
| قرد ( مذنب) = دحية ، القة سعدان | Monkey | مەیمون ، عەنتەر، مەیمونی کلکدار |
| قردة = القة | She-Monkey | مەیمونی میْ |
| قرد امريكي = ساكي | Saki | ( ساکی) مەیمونی ئەمریکی، مەیمونێکە ریش و کلکی تیسکنە |
| قرد مقدس ، هبار | Solemn ape = Simpai | جۆرە مەیمونێکی سوکەڵەیە ناوچەوانی خەرمانەیەکی رەشی پێوەیە لای هیندییەکان پیرۆزە |
| قرد | Stratocumulus | هەورێکە بریتییە لە خڕۆکی گەورەی رەش لەسەر بنکەیەکی ئاسۆیی تەخت، زۆرجار بەری ئاسمان دەگرێت بە تایبەتی لە زستاندا |
| قرحة الاستلقاء، قرحة الفراش | Decubital Ulcer = Bedsore | برینی پاڵکەوتن = برینی راکشان<br>برینێکە لە ئەنجامی زۆر راکشان لە جێگادا لە پشتدا پەیدا دەبێت |
| قرحة معدية | Gastric Ulcer | برینی گەدە، کولکی گەدە |
| قرحة سكرية | Diabetic Ulcer | برینێك لە ئەنجامی نەخۆشی شەکرەوە دروست دەبێت |
| قرد متقلنس - هجرس - كابوشين | Capuchin | کاپووشین= مەیمونی کلاْودار = مەیمونێکی رەنگ قاوەییە لەناوەراستی ئەمریکا و کۆلۆمبیادا دەژی قژی سەری وەکو کلاْوایە کلکی درێژە |
| قرد المغرب، قردوس، كاردوس، شديم | Magot = Barbary ape | مەیمونێکی بیْکلکە لە باکووری ئەفریقادا دەژی |
| قرد غير مذنب | Apes | جۆرە مەیمونێکە بیْکلکە لە مرۆڤ دەچێت |
| قرد كلبي | Mandril | سەگسار، سەگەمەیمون، عەنتەر، مەیمونێکە دەموچاوی لە سەگ دەچێت. |
| قرداتي = سائس القرود | Monkey Trainer | مەیمونەوان |
| قرد جزيرا | | ( گوزیرا) مەیمونێکی ئەفریقی جوانە پێستەکەی سپی و رەشە |

| | | |
|---|---|---|
| قطاس = قوتاش = خشقاء = ياك | Yak | ( ياك) گیاندارێکە لە کۆمەڵەی مانگا زۆر گەورەیە نزیکەی (٢) مەتر بەرز دەبێت و کێشەکەی نزیکەی( ٦٠٠) کیلۆ دەبێت ، لەشیردا لە گامێش دەچێت، کلکی لە کلکی ئەسپ دەچێت، گیاخۆرە بە شێوەی گەلە دەژی مووەکەی درێژە لە ناوەراستی ئاسیا دەژی |
| قطاف العنب | Grape harvest = Vintage | ترێ‌کردنەوە- ترێ چنینەوە |
| قطب ( مغناطيسي) = قطب ارضي مغناطيسي - قطب جغرافي | Pole = magnetic pole | پۆڵ - سەری دۆخ، هێتم، پیتە، جەمسەر، کۆرەك، پلسك، تەوەر، سالیس، هەردوو سەری تەوەری زەوی کە بە چەقی خرۆکی زەوی دا تێپەر دەبێ ، ئەو خاڵەی کەوا دەردەکەوێت کایەی کارەباییو موگناتیسی لێوە دەردەچێت |
| قطب ، حناء | Henna = Alcanna= Camphire | خەنە: دەوەنێکی کشتوکاڵییە رەنگەکەی سوورە گوڵەکەی بچووك و سپیی و بۆن خۆشە رەنگێکی سووری مەیلەو زەرد لە گەڵاکەی دەردەهێنرێت بۆ رەنگ کردن |
| قطب كهربائي | Electrode | جەمسەری کارەبایی، ئەلکترۆد، ( پۆڵی) کارەبایی |
| قطب سماوي | Celestial-pole | پۆڵی ئاسمانی- جەمسەری ئاسمانی |
| قطب كهربائي موجب - مصعد | Positive pole = Anode | جەمسەری کارەبای گەرم (+) ئەنۆد، جەمسەری کارەبای پۆزەتیف |
| قطب كهربائي سالب - مهبط | Negative pole = Cathode | جەمسەری کارەبای سارد (–) کاسۆد، جەمسەری کارەبای نێگەتیف ، لێشاوی ئەلکترۆن لە پۆڵی ساردەوە بەرەو پۆڵی گەرم دەچێت |
| قطب مغناطيسي | Magnetic pole | پۆڵی جەمسەری موگناتیسی ، پیتەی موگناتیسی، شێکی کارایە لە موگناتیس، هێزی موگناتیسی تیادا کۆدەبێتەوە |
| قطب شمالي | North pole | پۆڵی جەمسەری باکووری ، پیتەی باکووری ، دوورترین خاڵ لەسەر رووی زەوی لە باکوورەوە |
| قطب جنوبي | South pole | پۆڵی جەمسەری باشوور ، پیتەی باشووری ، دوورترین خاڵ لەسەر رووی زەوی لە باشوورەوە |
| قُطبة، قطب، مسك، بري | Caltrops | درك، کونجرە، جۆرە گیایەکە گوڵێکی زەردی هەیە بەرەکەی درکاوییە خرە زۆر تاڵە |
| قطبة، سهم الماء | Adders tongue Arrow-head | گیایەکی سەلکداری ئاوییە گەڵاکەی لەتیر دەچێت گوڵەکەی ئاوێتە و سێ‌پەلکە ، رەنگی سپی و سووری تیادایە |
| قطبان، قُطرب | False brome-grass | پەیکوڵ، رووەکێکی درکاوییە دەنکەکەی دەنوسێت بە شتومەکەوە ، گیایەکی دەشتەکییە لە کۆمەڵەی دەغڵ و دان |
| قطبية | Polarity | پۆڵێتی : خاسیەی ئەوەی کە دەرزی موگناتیسی روو دەکاتە پۆڵ |
| قطبية - نجم قطبي = جدي | Polaris | ئەستێرەی پۆڵی |
| قطب - مشمش بري | Strawberry = Tree | دارشلیك - جۆرە رووەکێکە |
| قطبي | Polar | پۆڵی - هەرشتێك پەیوەندی هەبێت بە پۆڵەوە |
| قطبة ، هوزن | Ketupa | جۆرێکی گەورەیە لە کوندەبەبوو رەنگەکەی خۆڵەمێشییە و هێڵی رەشی تیایە |
| قطبي جنوبي | Antarctic | پۆڵی باشووری - هەر شتێك پەیوەندی بە پۆڵی باشوور یان ناوچەی بەستەڵەکی باشوورییەوە هەبێت |
| قطبي شمالي | Arctic | پۆڵی باکووری - هەر شتێك پەیوەندی بە پۆڵی باکوور یان ناوچەی بەستەڵەکی باکوورییەوە هەبێت |

| | | |
|---|---|---|
| قطر | Region = District = Country | وولات، هەرێم |
| قطرة | Drop | تکە، دڵۆپ، تنۆك، چك، چکە، ڕێزە |
| قطرة العيون | Eye drop | دەرمانی چاو |
| قطرة غسول العين | Collyrium | قەترەی چاو شتن |
| قطر ( للدائرة) | Diameter | تیرە، ئەشکیل، ئەشکێل ، هێڵێکە دوو بنکەی بەرامبەر یەك لەسەر چێوەی بازنە دەگەیەنێت بەیەکەوە بە چەقی بازنەکەدا تێپەڕ دەبێت ئەو هێڵەیە دوو سەری بەرامبەر لە شێوەیەکی ئەندازیاری دەگەیەنێت بە یەك وەکو تیرەی چوارگۆشە |
| قطري | Dimetral = Dimetrical | تیرەیی - هەرشتێك پەیوەندی بە تیرەوە هەبێت |
| قطرة فينول | Phenol drops | دڵۆپی فینۆڵ ، بۆ گوێچکە |
| قطرة افيدرين | Ephedrine | دڵۆپی ئەفیدرین بۆ لووت |
| قطر ( ماغما) | Magma | ( ماگما) بەردی شلەوەبوو لە ناخی زەویدا |
| قطران الغاز | Gas tar | قەترانی گاز |
| قطران الصنوبر | Pine tar | قەترانی سنەوبەر - قەترانی کاژ |
| قطـران - دجالـة - قطران الفحم | Tar = Pitch = Coal tar | قەتران، شلەیەکی نیمچە ڕەقی لینجی مەیلەو ڕەشە لە ئەنجامی دڵۆپاندنی ( خەڵوزی بەردینـەوە) دەسـتگیر دەبێـت بریتیـیـە لـە تیکـەڵاوی چـەند مادەیـەکی هایدرۆکـاربۆنی چـەور وەکـو ( بـەنزاین و تۆلوویـن) ئەگـەر بکوڵێنرێت گەلێك مادەی بە کەڵکی لێ وەردەگیرێ وەك نەوت |
| قطرب، قطروب | Colobus | کۆلۆبەس- جۆرە مەیمونێکی سووکەڵەی تیسکنە ، ڕەنگەکەی ڕەش یـان بەڵەك یان قاوەیییە ، کلکی درێژە |
| قطرب - يراعة = سراج الليل حباحب | Firefly | گوڵە ئەستێرە ، مێرووێکە بەشەو ڕووناکی دەداتەوە |
| قطرم، حشيشة الهر | Catmint = Catnip, Nep | گیایەکی دەشتەکی بۆن خۆشە لە شوێنی شێداردا دەروێت گوڵەکەی شین یان بنەوشەییە |
| قطرس - قادوس | Albatross = Diomedes | ( بەلباترۆس) باڵندەیەکی دەریایی گەورەیە نزیکەی ( ١,٥-٢)مەتر مەتر درێژ دەبێت ڕەنگەکـەی سـپییە باڵەکەی خۆڵەمێشـییە یـان قاوەییـە ، دەنووکی سەرەوەی چەماوەیە بۆ خوارەوە |
| قطع - استئصال | -Ectomy | پاشگرێکە بە مانای بڕین |
| قطع الوريد | phlebectomy= Venectomy | خوێنهێنەر بڕین = بڕینی بۆری خوێنهێنەر |
| قطع العظم | Osteotomy | ئێسك بڕین |
| قطع العضلة | Myotomy | ماسولکە بڕین |
| قطع الغدة | Adenectomy | لووبڕین |
| قطع الجذور | Rhizotomy | ڕەگ بڕین |
| قطع اللوزتين | Tonsillectomy = Anitotomy = Antiolomy | ئالوو بڕین |
| قطع العظم | Ostectomy | ئێسك بڕین |
| قطع العضلة | Myotomy | ماسولکە بڕین |
| قطـع الخـزب ، قطـع القلـق - ختان | Circumcision | خەتەنەکردن |
| قطع الاظافر | Onychectomy | نینۆك بڕین |

| | | |
|---|---|---|
| قطع الثدي | Mastectomy | مەمك برینەوە |
| قطع البواسير | Hemorrhoidectomy | مایەسیری برین |
| قطع الضللع | Costectomy = Costotomy | بڕینی پەراسوو |
| قطع المثانة | Cylectom y | بڕینی میزلّدان |
| قطع الامعاء | Enterectomy | بڕینی ڕیخۆڵە |
| قطع المعدة | Gastrectomy | بڕینی گەدە |
| قطع اللسان | Glossectomy | بڕینی زمان . |
| قطع الاعور | Typhectomy | بڕینی ڕیخۆڵە کوێرە |
| قطع الرحم | Hysterectomy = Uterectomy | بڕینی ندالّدان |
| قطع القزحية | Iridectomy | بڕینی پەلەزەی چاو |
| قط القرنية | Kerectomy | بڕینی ووشکێنەی چاو |
| قطع الحنجرة | Laryngectomy | بڕینی قورگ |
| قطع الضجال | Lienectomy | بڕینی سپڵ |
| قطع المبيض | Oophorectomy | بڕینی هێلکەدان |
| قطع العين | Ophthalmectomy | بڕینی چاو |
| قطع الحضية | Orchidectomy = Testectomy | بڕینی گون |
| قطع الاذن | Otectomy | بڕینی گوێچکە |
| قطع البنكرياس | Pancreatecomy | بڕینی پانکریاس |
| قطع السلامية | Phalangectomy | بڕینی بەنجە |
| قطع البلعوم | Pharyngectomy | بڕینی گەروو |
| قطع الغدة الصنوبرية | Pinealestomy | بڕینی لووی سنەوبەری |
| قطع الغدة النخامية | Pituitectomy | بڕینی لووی پیتویتەری - بڕینی لووی ژێر مێشك |
| قطع الرئة | Pineumectomy = Pulmonectomy | بڕین سی |
| قطع الصفن | Scrotectomy | بڕینی توورەکەی گون |
| قطع الحبل المنوي | Spermectomy | بڕینی پەتکی سپێرم |
| قطع الكظر | Adrenal-ectomy | بڕینی لووی ئەدرینال - بڕینی لووی سەر گورچیلە |
| قطع اللهاة | Staphylectomy | بڕینی زمانە بچکولە |
| قطع الناسور | Syringectomy | بڕینی دوومەڵ |
| قطع عضروف الجفن - الرصغ | Tarsectomy | بڕینی کرکراگەی پێڵوی چاو |
| قطع السرة | Umbilectomy | بڕینی ناوك |
| قطع الحالب | Ureterectomy | بڕینی بۆری میزەڕۆ |
| قطع الفقرة | Vertebr-ectomy | بڕینی بربڕە |
| قطع الفرج | Vulvectomy | بڕینی قوز |
| قطع المهبل | Vaginectomy | بڕینی گوڵنیك ( مهبل) |
| قطع شغاف القلب - التامور | Pericard-ectomy | بڕینی پەردەی دڵ |
| قطع الثدي | Mammectomy | مەمك بڕین- بڕینی مەمك |

| | | |
|---|---|---|
| قطع الغدة الصعترية - قطع الغدة التوتية | Thymectomy | بڕینی لووی جاترەیی : لوویەکی بچووکی تەرە نزیك بە بنکی مل |
| قطع الغدة الدرقية | Thyroid-ectomy | بڕینی لووی ثایرۆید ( لووی قورقوراگە). |
| قطعالوتر | Tenotomy | بڕینی ژێ |
| قطع المستقيم | Proctectomy | بڕینی ریخۆڵە ڕێکە |
| قطع الحلمة | Papillectomy | بڕینی مەمیلە |
| قطع الرضفة | Palellectomy | بڕینی کلاوەی ئەژنۆ |
| قطرون - ربعون | Quadroon | کوادروون- منالێك لە باوکێکی سپی و دایکێکی زنجی بێت |
| قطش - كشمة | Anotia | نەبوونی گوێچکە بە زکماکی |
| قطط - داء الشعرة - شتر داخلي | Trichoma = Entropion | نەخۆشییەکە لە چاودا |
| قط | Transection = Discission | بڕین بە باری پانیدا ، دادان وەکو دادانی قەڵەم |
| قطع | To cut = felling | بڕین، بچڕین، ژێکردن، دابڕین، ژنفەکرن |
| قطع الاخشاب | Logging | داربڕینەوە |
| قطعة | Portion = pieces | پارچە ، لەت، کوت، بەش، کەرت |
| قطع | _Ectomy | پاشگرێکە بە مانای بڕینەوە |
| قطع مستعرض | Cross section | برگەی پانی |
| قطع طولي ، مقطع طولي | Longitudinal-Section | برگەی درێژ |
| قطع ناضجة | Matured segment | پارچەی پێگەیشتوو، وەکو لە لەش |
| قطعة الدائرة | | پارچە بازنە |
| قطعة ارض | Hide | پارچە زەوی |
| قطعات الجيش | Army troops | کۆمەڵەی لەشکر |
| قطع جزئي- حذم | Resection | بڕینی بەشێك لە ئەندامێك |
| قطع السن | Odontectomy | بڕینی ددان |
| قطع الثرب | Omenlectomy | بڕینی پەردە چەورەکەی ڕیخۆڵە |
| قطع الزائدة الدودية | Appendectomy | بڕینی ڕیخۆڵە کوێرە |
| قطع المرارة | Cholecystectomy | بڕینی تورەکەی زراو |
| قطع الغضروف | Chonderctomy | بڕینی کرکراگە |
| قطع اللهاة | Cionectomy | بڕینی زمان بچکولە |
| قطع البظر | Clitoridectomy | بڕینی قیتکە |
| قطع الناسور | Fistutectomy | گرێ بڕین- مووبڕین |
| قطع الفلة التناسلية | Gonadectomy | بڕینی لووی (گلاندی) |
| قطع الكبد | Hepate ctomy | بڕینی جگەر |
| قطعة من اللحم ملتصقة بالعظم | | گرتك |
| قطعة سكر | Lump of sugar | کلۆشەکر |
| قطعة ( فحم) | Lump of Coal | سەلکە خەلووز |
| قطع جسمية | Body Segment | پارچەی لەش |

| | | |
|---|---|---|
| قطع السرة | Ompha lotomy | ناوك بڕین |
| قطعة الفرس | Equvleus, The colt | پارچەی ئەسپ- كۆمەڵە ئەستێرەیەكە |
| قطع الأظافر | Onychectomy | نینۆك بڕین |
| قطف | To gather =To pluck = Pick = Harvest = Gathering | كردنەوە ، چنین، ڕنین، دارنین |
| قطف | Balsam of Kataf | جۆرێكە لە ڕووەكی بەلسەم ، تەختەكەی چاكە ئاوكێكی ڕاتنجی لە قەدەكەی دەردەهێنرێت ، لەم ئاوكە زەق و ڕۆنی بۆن خۆش دروست دەكرێت |
| قطفة | Orach | راجع (سرمق) |
| قطعة خبز محمص | Crouton | پارچە نانی برژاو |
| قطـف - سـرمق - اسفاناخ رومي - رغل | Mountain-spinach = Sea purslane = Orach | سپێناخە كێویلە - سپێناخی ڕۆحی |
| قطقـاط، تـورم، طيطـوي، ابوطيـط، سقساق ، زقزاق | Spur-winged-plover = Pluvian | زیقاوڵە، باڵندەیەكە لە كوێ ئاودا دەژی دەچێتە ناو دەمی تیمساحەوە هەرچی كرمێكی تیادا بێت دەیخوات |
| قطقط | Sleet | تەرزە، تەرزەلۆكە، زوقم، شەختە، زریان ، باراناوێك كە بە تەواوی یان بە نیوەچڵی بەستبێتی وە بووبێت بە سەهۆڵ، هەروەها بریتی‌یە لە تێكەڵاوی بەفروباران |
| قطلب، قطلب عصير الدب، جنـاء احمـر = شجرة الدب = قاتل ابيه | Arbute = Strawberry Cane Apple | تووترك - توودڕك : دارو دەوەنێكە گەڵاكەی هێلكەییە و دواندارە گەڵاكەی بۆ دەباخ كردن باشە، گوڵەكەی لە زەنگوڵە دەچێت بە شێوەی هێچشووی پەمەیی یان سپی یان فستقی‌یە ، بەرەكەی لە شیلك دەچێت ئەرخەوانی یان پەمەیی‌یە |
| قطل | Felling Clear | داربڕینەوە- لەبندا بڕینەوە |
| قطلس - سياف - ابوسيف | Sword fish | شیرەماسی ، شیر دەریا : جۆرە ماسی‌یەكی درێژە لە شمشێر دەچێت شەویلگەی سەرەوەی وەك شیر باریك و درێژە ، دڕندەیە |
| قطلس | Sword = Cutlass | شیر، شمشێر، قلیچ، كەتلاس : شیرێكی قورسی چەماوەیە جاران دەریاوانەكان بەكاریان دەهێنا |
| قطمر | | شەست پەڕ ، ناوی گولێكە |
| قطمبور | Wild ox | جۆرێكە لە مانگا كێوی |
| قطمير - سيراء | Tegument = Tegmen = Pellicle | پەردەی گەرا یان تۆو ، پەردەی نێوانی بەر و تۆو |
| قطن، برس، عطب، كرسف | Cotton | لۆكە، پەمۆ، پەموانە، پەمگ، پەمبی : ڕووەكێكە بەرەكەی بە شێوەی قۆزاخەیە، ڕیشاڵێكی پێوەیە جیادەكرێتەوە و دەچنرێت بۆ قوماش ، هەروەها دەنكەكەی ڕۆنی لێ‌دەردەهێنرێت |
| قطنة = ذات التلافيف | Omasum | هەزار لۆغانە: گەدەی سێ‌یەمی گیاندارە كاوێژكەرەكان |
| قطن طبي | Absorbent cotton | لۆكەی پزیشكی |
| قطن شجري | arborescent-cotton | لۆكەی درەخت- درەختی لۆكە، درەختێكە بە تایبەتی لە هیندستان دەڕوێت |
| قطن ، قطنية ، حقو | Lumbar = lumbus | كەمەرە، كورتە كەلەكە، خالیگە خافیگ ئەو بەشەیە كە دەكەوێتە نێوانی پەراسووەكان و ئێسقانی سێبەندە لە هەموو تەنیشتەوەی خوارەوەی پشت |
| قطني الذنب | Cottontai | كلك لۆكەیی، جۆرە كەروێشكێكی كلك سپی و تیسكنە. |

| | | |
|---|---|---|
| قطني ، حقوي | Lumbar | خالیگەی ، هەرشتێك پەیوەندی بە خالیگەوە هەبێت. |
| قطن = زمكي | Rump | شوێنی ڕووانی پەڕی كلك لە كلێنچكەی باڵندەدا |
| قطوباء | Cotula | ( كۆتەلا) : گیایەكە گەڵاكەی پەلكدارە گوڵەكەی ورد و بچووكە |
| قطونا = بزر قطونا – حشيشة البراغيث | Flea-wort | گیاكێچ، جۆرە گیایەكە |
| قطن اشموني | Egyptian-uppers | لۆكەی میسری |
| قطن جاوة = قطن كاذب - قابوق | Java Cotton = Kapok | كاپۆك، لۆكەجاوا، لۆكە درۆزنە: درەختێكی ناوچە گەرمەكانە بەرمەكەی ڕیشاڵی تێدایە لە لۆكە دەچێت |
| قطن البـاروي = نتروسلليلوز | Cellulose nitrate = Pyroxilin = Nitro cellulose | لۆكەی باروو/ مادەیەكە لە ئەنجامی كارلێكی سلیلۆزی لۆكە لەگەڵ ترشی نایتریك و ترشی گۆگردیكدا پەیدا دەبێت ، بە شێوەی تەقەمەنی بەكاردێت |
| قطيع ، قطيع الحيوان | Flock, Herd = Drove, Sheep | ڕەوە، ڕەووگ، گەلە، جەلەب، مێگەل، ران، جەلەو، جەلە، گۆتاڵ، كەرێ پەزی ، گاران |
| قطيع الذئاب | Herd or drove of | وەرگان، كەلەگوتك |
| قطيع الخنازير | Hed or drove of Pigs | هووڕە، كەلەبەراز |
| قطيفة ، قطائف | | ماجومی، كاڵكان، پڕپۆڵە، قەیفە |
| قطيع من الحملان | Flock of tirds | بەرغەل، بەرخەل، ساوە، كەركەمەڕ، بزگەل |
| قطيع من انثى الإبل | Parcel | مێگەلی گەوەزن |
| قطيفة ، قذيفة ، سالف العروس - دلاق، رعاف- شدخ | Amaranth = White feather = Blite = French Marigold | بزگیلە ، گوڵە قەیفە، بادرو ، ئاتەشی: شەست پەر ، جۆرە گیایەكە گوڵەكەی لە گوڵەگەنم دەچێت ، شێوەكەی قوچەكی یان لە پۆپنەی كەڵەشێر دەچێت، هەندێكی گەڵاكەی دەكرێت بە چێشت ، ڕەنگی لق و گەڵا و گوڵەكانی ئەرخەوانی یان سپییە |
| قطيط = اسطر اغالس | Astragalus | كەتیرە |
| قطيطة - جرو القط | Kitten = Young cat | بەچكەشێر |
| قطيرة ( ماء) | Drop | چیك، تنۆكە، دڵۆپ |
| قطيل - بشكير | Towel | خاولی- پەشتەماڵ |
| قطيع الخيل | Herd = Drove | ڕڤۆ، كۆمەڵێك ئەسپ و ماین |
| قطيع البقر | Herd = Drove | گاران، كۆمەڵێك لە گا و مانگا |
| قطيع الغنم | Flock | ڕانەمەڕ ، كەرێ پەزی ، كۆمەڵێك مەڕ |
| قطيع من الطيور | Flock | پۆلە باڵندە- كۆمەڵێك لە باڵندە |
| قعاد، مقاع، قع | Salty = bring | سوێر |
| قعاس، قعاص، جدري الضان - نبج | Immobility | دەردێكە دەدات لە ووڵاخ و پەكی دەخات لە ئیش كردن |
| قعاس | Sheep-pox | ئاوڵەی مەڕ = جۆرە نەخۆشییەكی كوشندەیە لەناو مەڕ و ماڵاتدا بڵاودەبێتەوە |
| قعاس | Retraction of neck | گرژبوونی مل |
| قعادة - قصرية - نونية | Chamber-pot = Bedpan | ئاودەستی دەستگێر، قەعادە |
| ورقه التويج، قعاله، بتلة | Petal | پەڕەی گوڵ |
| قعانب، معنب | He fox | نێرە ڕێوی |
| قطوع | Sectile | بڕەر |

| | | |
|---|---|---|
| قطيفة = عرف الديك | Cocks comb = qmaranthus = Love lies bleeding = | پۆپنە کەلەشێر= سەوك قەیفەی پۆپنەی کەلەشێر : ڕوەکێکی گوڵدارە |
| قعبل | Death cap | قارچکە مارانە ، قارچکە گوڵانە |
| قعبل - نرجس بري | | ڕووەکێ:ە لە کۆمەڵەی نێرگز لە قەراغی گۆم و دەریاکاندا دەڕوێت |
| قعبول، زهـرة اللؤلـؤ الافريقية | African Orange daisy | ڕووەکێکە گەلێك جۆری هەیە هەندێکی لەگەڵ دوومەڵان دەڕوێت سەکی هەیە دەخورێت، هەندێکی بۆ ڕازاندنەوەیە ، گوڵەکەی گەورەیە زەرد و سپییە |
| قعبارون - قشرة سوداء | Black Salsify | هەڵە کۆکی ڕەش |
| قعثبان | Xyocopa | زیلۆکۆپا: مێرووەکە لە هەنگ دەچێت ڕەنگەکەی شینی مەیلەو ڕەشە، قەدی درەختی بەردار کون دەکات و هێلانەی تێدا دەکات |
| قعر | Fundus = bottom | بن، ناخ، بنك |
| قعس - بزخ - قطاء | Lordosis = Lordoma | چوونە دەرەوەی سنگ و سك و هاتنەو ژوورەوەی پشت - سنگ دەرپەڕین ، کۆم بوون بۆ پێشەوە |
| قعسي | Lorclotic | سنگ دەرپەڕیو - کەسێك سنگی دەرپەڕێنێ |
| قعساء ، قعض | Formica-animosa | مێرووەکی گەورەی سووری ناوچە گەرمەکانە |
| قعض - احناء | Arching | چەمانەوە |
| قعقاع | Clatter = Clash | دەنگی چەك، تەقوهوور. |
| قعقعاني | | دەنگی جومگە قولە پێ لە کاتی ڕۆیشتندا |
| قعقعة | | خرنگە، خرینگە، چکەچك، تەقتەق، چرنگەچرنگ |
| قعقعة | Cray of falcon | دەنگی هەڵۆ |
| قعقب،طير النصيب، طير الكاتب | Secertary-bird | باڵندەی نوسەر: باڵندەیەکی گەورەی سوکەڵەیە پەڕی بەسەرەوەیە دەنووکی ئەستوور و چەماوەیە مل و کلك و لاقی درێژە پشتی خۆڵەمێشییە باڵی قاوەییە ماردەخوات |
| قعقع ، وبية = عقعق | Small hoe Magpie | قشقرە ، قەلەباجکە، قشقەلانك، قاژوو، قشقەلە، جۆرێکە لە قەلەڕەشکە ڕەش و سپییە کلکی درێژە |
| قعموص | Truffle | جۆرێکە لە دوومەڵان |
| قعوة - اصل الفخذ | Femoral origin | بنی ڕان، بێخی ڕان |
| قعيطة | Partridge | سوێسکە ( باڵندەیەکە) |
| قعيد - حورية الجرادة | Pupa = nymph | پیێڕەوکەی کوللە |
| قعيل | Buck-rabbit | نێریە کەروێشك |
| قعود - جلوس | Sitting | دانیشتن |
| قعود - سن الياس | Menopause | تەمەنی نائومێدی = تەمەنی بڕانی بێنوێژی لە ئافرەتدا |
| قعولة | | خوارو گێری لە دەست و قاچدا، مەچەك خواری، قاچ خواری بۆدیوی ناوەوە |
| قعن | | لووت کورتی ، لووت بچووکی ٠ راجع ( قصر الانف) |
| قف | Hillock | گردۆڵکە - گرێکی بچووك |
| قفـاء ، قفـا- قـذال- مؤخـر الراس | Nape = Occiput = Poll = Inion | ڕنسمە ، بۆق مل، پشتی مل، پشمل، پاتك، گێپەڕەی مل ، بۆقەتە= پشتی سەر |

| | | |
|---|---|---|
| قفاز ، كفوف | Gloves = Mitten | دەستكێش ، باڵە، پەنجەوانە، دەستگۆرك، تەنك |
| قفاز النحال | Bee gloves | دەستكێش بۆ ئەو كەسەی كە هەنگوین دەردەهێنێت |
| قفاز | Gauntlet | دەسكێش بۆ برین لە دەست دەكرێت |
| قفاز حديدي | | قەیناغ، دەسكێشێكی ئاسنە درەوكەر لە دەستی دەكات بۆ ئەوەیە لە كاتی درۆێنەدا دەست بریندار نەبێت |
| قفاز الثعلب - إصبع العذراء - قمعية ارجوانية | Fox glove | دەستكێشی ڕێوی ، جۆرە ڕووەكێكە دەرمانی دیجیتالیسی لێ‌دەردەهێنرێت بۆ نەخۆشی دڵ |
| قفازة ، طفارة | Zamenis-rhodorachis | تیرەمار، مارێكی بارێكی درێژە باز دەدات لە نێوانی بەرد و لەدا |
| قفاص - التهاب المفصل | Arthritism | نەخۆشی‌یەكە دەدات لە پەلی چوار پێ ووشكی دەكات |
| قفاص ، وعل | Ibex | بزنەكێوی |
| قفاع - تقفع | Contracture | ١. نەخۆشی‌یەكە دەدات لە پەلی مەڕ و ماڵات خواری دەكات .<br>٢. كرژبوونی ماسولكە بەشێوەیەكی هەمیشەیی |
| قفال | Lock-smith | قفڵ دروستكەر |
| قفا العملة | The back of the coin | خەت- دیوی پشتەوەیس پارەی مەعدەنی |
| قفار | Dry bread | نانی ووشك |
| قفاز - لوح النهوض | Spring board | لەوحەی بازدان - ئەو تەختەیەیە كە مەلەوان لەسەری دەوەستێت بەر لەوەی باز بداتە ناو ئاوەكەوە |
| قفاز الطين | Mud-skipper | بازدەری قوڕ = ماسی‌یە خلیسكە : ماسی‌یەكە بەسەر قوڕدا خۆی دەخلسكێنێت |
| قفاز لليد و الرسغ | Mitten | دەست كێشی دەست و مەچەك |
| قفة | Strawbag = Hamperfrial | قایغ، دەسەكەشتی، قیرسەبەتە |
| قفة - زنبيل | Fruit-basket | سەبەتەی میوە |
| قفر- حنف | Strephopodia = Ctallpes equinus | نارێكی لە پێی وولآخدا بە شێوەیەكی زكماكی |
| قفر، صحراء ، بادية | Desert | چۆڵ ، بیابان، زەوی ووشك |
| قفري | Xerophyte | ڕووەكی بیابانی كە بەر ُستی ووشكانی دەكاتی |
| قفرة | Alkaphra | ئەلكافرا- ناوی ئەستێرەیەكە بە عەرەبی |
| قفز، قفزة - وثب | Jump = Saltation | باز، بازدان، گومەتە، قەلبەزە، قاچاندن |
| قفز عالي | High Jump | قەلەم باز- بازی بەرز |
| قفز عريض | Broad jump | بازی پان |
| قفز على الرجلين | | قونە، ڕۆیشتن و بازدانی هەندێك پەلەوەر وەكو چۆلەكە |
| قفزية ثلاثة | Step and jumb | بازی سیانی ، جۆرێكە لە یاری بازدان |
| قفزية ( لعب) | Leap frog | یەكەو حەیزەران ، یەكە و گۆتەكە ، بازدان بەسەرپشتی یەكتریدا ، جۆرێكە لە یاریی وەرزشی . |
| قفز الصورة | Picture bounce | یاریكرد نی وێنەی تەلەفزیۆنی یان سەركەوتن و داكەوتن |
| قفز بالزانة | Pole vault | یاری زانە - زانە گۆچانێكە یان دارێكە لە حەیزەران یان مەعدەن (١٤-١٨) پێ درێژە و كێشەكەی (٥-٧) لیبرەیە ( لیبرە -٣٢٧غم) |
| قفز الى الماء | Tumbling-in | بازدانە ناو ئاو |

| | | |
|---|---|---|
| قفز حر | Free fall | بازدانی سەربەست= بازدانی ئازاد |
| قفساء | Stomch of the ruminants | گەدەی کاوێژکەر، کە بریتییە لە چواربەش: ورگ و کلاوقازی و هەزار لۆغانە و شیلاوگ |
| قفش ، قفشة | Hoot | پێلاو ، نەعل |
| قفص | Cage = Cradle | قەفەز، رەگەم ، رکەڵ ، بیرم، بێرم، ڕکەو |
| قفص كبير لنقل البضائع | Crate | قەفەزی گەورە بۆ گواستنەوەی شتومەك |
| قفص صدري | Thorax = Hemal Cavity | قەفەزی سنگ ، کەلی سنگ |
| قفص = سبت = سلة | Basket | سەبەتە |
| قفص الصيد | Cage trap | قەفەزی راوکردن وەکو تەڵەیەك بۆ راوکردنی باڵندە |
| قفص كهربائي | Electric cradle | قەفەزی کارەبایی |
| قفقفة ، اصطكاك الاسكان | Ondonterism = Chattering | دانەچۆقێ- ددان بەریەکتری - چۆقچۆقی ددان |
| قفل | Padlock | قفڵ، کۆك، کۆرك، کێلون، کلۆم، کلیلدان |
| قفل امان | Safety lock | قفڵی دڵنیایی = قفڵی بێوەیی |
| قفل | To Close = To Shut | داخستن |
| قفل خشبي | | کلۆم ، کلیل و کلۆمی دار ، گکە لە جیاتی قفڵ دەرگا پێدادەخرا |
| قفزية | Leap Frog | یەکەوحەیزەران ، یەکە و گۆتەکە ، یارییەکی وەرزشییە یەکێك بەسەر پشتی یەکێکی تردا باز دەدات |
| قفل | Balm of Kafal | جۆرێکە لە درەختی بەلسەم گەڵاکەی ئاوێتەیە ، گوڵەکەی سپی و بچووك و بۆن خۆشە، بە قلیشاندنی تەختەکەی ئاوگێکی زەمقی بخوردی لێدەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی |
| قفلوط ، كراث اندلس | Shallot | کەوەری ئەندەلوسی: جۆرێکە لە کەوەر بۆ مەبەستی خواردن و پزیشکی بەکاردێت |
| قفن | Occiput | خوارەوەی پشت |
| قفندر | Halibut | هالیبوت: ماسییەکی پانکەڵەی گەورەیە |
| قفوي | Nachal = Occipital | پشت ملی- شتێك پەیوەندی هەبێت بە پشتەملەوە |
| قفير ، خلية النحل | Frame-hive = Bee-hive | شانەی هەنگ، دوو بەرەی هەنگوین |
| قفيشة | | پانی بەرز، پاپەجانی جۆرێکە لە پێڵاو |
| قفيف - حشيش | Hay | پووش، کا |
| قفطان | Kaftan = Oriental Outer garm | قەفتان- رۆب، عەبا، کەوا |
| ققنس، تم | Swan | قاز |
| قفندر = سفندر | Knee-holly | مۆرەکێویلە، جۆرێکە لە رووەك |
| قفير الذبابير - عش الذبابير | Nest | شارە زەردەواڵە |
| قفيز - لسان الكلوف | Snap | زمانەی کێلون |
| قفيز القفل | Hasp | قەفیزی قفڵ |
| قفيز المواسير | Pipe-hook | زمانەی بۆری |
| قفيز ذو حلقة | Snap-ring | قەفیز- سۆندەی پێقایم دەکرێت |

| | | |
|---|---|---|
| قفيزي - حصان الوثب | Vaulting horse | ئەسپە دارینە= ئەو ئەسپەی لە دار دروست دەکرێت و بازی بەسەردا دەدرێت |
| قلاب | Syrian bean-Caper | دەوەنێکی ڕازاندنەوەیە گوڵەکەی گەورە و جوان و ئەرخەوانییە ، بەرەکەی لە ترێ دەچێت. |
| قلادة - قلامة | Neck lace = Lavaliere | گەردانە، ملوانکە خەناوکە، ڕستاک ، بەرموور |
| قلادة | Kiladah | ملوانکە ، ناوی ئەستێرەیەکە بە عەرەبی |
| قلادة المواشي | | کەلاحە، ملوانکەی ئاژەڵ. |
| قلادة السلوقي | | سنك، مەرس، ملوانکەی سەگ و تانجی. |
| قلادي | Monilliform | ملوانکەیی- تەزبیحی - هەرشتێك پەیوەندی بە ملوانکەوە هەبێت |
| قلار | Yellow-fig | هەنجیری زەرد |
| قلاع - لطع | Thrush = Aphtha | بۆقڕە= نەخۆشی‌یەکی درمە جۆرە زیپکەیەك پەیدادەکات لە پێستی ناو دەم و زمان و دەست و قاچ، نەخۆشی بۆقڕە لە دەمی منداڵدا بە هۆی کەڕووەوە پەیدا دەبێت |
| قلاعة | Aphtha | زیپکەیەکی بچووکی سپی‌یە لەناودەمی گیانداری نەخۆشدا پەیدا دەبێت |
| قلاع - قلاعة | Muguet = Stomatite = Aphtha | نەخۆشی‌یەکی درمە دەبێتە هۆی ئاوسانی پەردەی ناودەم و پەڵەی سپی لەسەر زمان ، لەناو مەڕو ماڵاتدا بڵاودەبێتەوە ، ئازاری زۆرە بە هۆی کەڕووەوە دەبێت |
| قلاع | Sick-wort = Self-heal | گیایەکی دەشتەکی وبۆن خۆشە گوڵی هەمەڕەنگە دەگرێت سوور یان شین یان بنەوشەیی یان سپی |
| قلاعة | Grubber | گاز، گازی ئاسن، بۆ دەرکێشانی بزمار |
| قلاعة - محفاة | Grubbing plough | ئامرازی هەڵکەندنی سەلکی پەتاتە و چەوەندەر و شێلم |
| قلاع - شراع | Vela | چاروکەی کەشتی - کۆمەڵە ئەستێرەیەکە |
| قلابة - عربة قلابة | Tipcart = Tipper | گەلابە= گالیسکە یەکە شتومەکی تێ‌دەخرێت و لە شوێنێکی تر قلپی دەکاتەوە |
| قلاء | Alkalosis = Alcalosis | قلیەیتی = زۆر بوونی ڕێژەی قلیە لە خوێن و شانەکانی لەشدا |
| قلاب | Cardio Pathy | نەخۆشی دڵ |
| قلال | Palisade | کەپر، کەپری مێو |
| قلامي | | کۆمەڵە ئەستێرەیەکە ، چەند ئەستێرەکە جمکی تیادایە |
| قلام | Conandron | زەرتك، کاژیلە، کابیشە، گیایەکی سەلکدارە گوڵەکەی بە شێوەیهێلووی لەیلاقی‌یە |
| قصاصة الظفر = مقلمة الظفر = مقساسة الظفر | Clipper | مەکینەی نینۆك - نینۆك بڕ |
| قلامة الظفر | Parings = Clipping of Nails | سەرە نینۆك |
| قلاوظ- قلاووز - لولب - مسمار ملولب | Screw = Screwnail | برغو، جەڕ، هەڵکەندنی چاڵی پێچاوپێچ لەسەر شیش و بۆری ، دایس |
| قلايي | | قەلآیی، قەلانیك، سرقت، دارشتەیەکە لە تەنەکە و قورقوشم ، ژنان بۆ سپیاو بەکاریدەهێنن. |
| قلائص | Hyades | ( هیادیس) = هێشووە ئەستێرەیەکە لە کۆمەسارەی ( کوکبە) گا ( الپور) دا |
| قلب | Heart= Core | ناوجەرگە- ناوجەرگەی شتێك یان شوێنێك |

| | | |
|---|---|---|
| قلب مستطيل | Oblong heart | دڵەلاکێشەیی- جۆرێکە لە سەدەف |
| قلب مثلوث | Cortilociare | دڵی سێ‌خانە: ئەو دڵەی کە دیواری نێوان دوو کوڵەکەی یان دوو گوێچکەلەکەی تیادانییە، لەبەرئەوە بووە بە سێ‌خانە لە جیاتی چوار |
| قلب بقري - قلب تبقري | Cor-bovinum | ئاوسان و ئەستووربوونی سکۆڵەی چەپی دڵ |
| قلب المفاعل | Core of reactor | دڵی یان ناوجەرگەی کارپێکەری ناوکی |
| قلب ( للمغناطيس) | Core | دڵی‌یان جەرگەی بازنەی موگناتیسی ئەو بەشە ئاسنەیە کە کلاوەکەی تێوەپێچراوە |
| قلبة = شقلبة | Somer Savit = Somer Set | سەرمەقولات، تەقلەلێدان ( لە وەرزشدا) |
| قلبة هوائية | Tomboyaeri | تەقلەلێدان لە هەوادا ( وەرزش) |
| قلب ( كلبر) | | کەشتی‌یەکی چارۆکەداری تەسك و باریکە |
| قلب ، فؤاد | Heart = Core | دڵ، ئەندامێکە لە لای چەپی سنگەوە لە هەرمێ یەکی سەربەرەوخوار دەچێت ، وەك ترومپا خوێن دەنێرێت بۆ لەش و لێی وەردەگرێتەوە لە چوار بەش پێك هاتووە |
| قلب هاجر - قلب هابط | Ectocardia | دڵی داخراو= دڵی داکەوتوو |
| قلب صناعي | | دڵی دەستکرد ، ئامرازێکی دەستکردە لە شێوەی دڵا دەخرێتە لەشی ئەوانەی کە دڵیان دەردەهێنرێ بە هۆی نەخۆشی‌یەوە پاڵ بە خوێنەوە دەنێت بۆ لەش هەروەکو دڵ ئاسایی |
| قلة الفهم - عدم الفهم | Acatalepsia | کەم تێگەیشتن |
| قلة اللبن | Oligogalactia | کەم شیری |
| قلة السمع | Hypacusia | گوێ گرانی |
| قلة قلوية الدم | Acidosis | کەمی‌ی ئەلکالێتی خوێن |
| قلة البول | Uropenia = Oligurla | میزکەمی |
| قلة الحيض | Oligomenorrhea | حەیزکەمی |
| قلة الدم | Anemia = oligemia | خوێن کەمی |
| قلة العرق | Oligidria | ئارەق کەمی |
| قلة النطف | Oligospermia | کەمی سپێرم ( مادەی نێر) لە ئاوی پیاودا |
| قلب متدلي | Pendulovs-heart | دڵی شۆڕ - دڵی داکەوتوو |
| قلب العقرب - نير العقرب - برج العقرب | An tares, scorpion | دڵی دووپشك: ئەستێرەی جەد، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی نەگەڕۆکن کە لە بورجی دووپشك |
| قلبي - فؤادي | Cardio = Cardiac | دڵی - هەر شتێك پەیوەندی بە دڵەوە هەبێت |
| قلب الاسد | Corleonis | ئەستێرەیەك نەگەڕۆکە لە بورجی ( شێر) |
| قلب مريم | | دڵی مریەم : ڕووەکێکی ڕازاندنەوەیە گوڵەکەی قرمزی و شۆڕە |
| قلب مستطيل | Oblong heart | دڵە لاکێشەیی: جۆرێکە لە سەدەف یان قاڵە |
| قلبوس | Plebelus | پەپولەیەکی ڕشەنگینە زیان بەخشە بە ڕوەك |
| قلبة | | دانوولە ، گەنمەکوتاو، بۆ خواردن بەکاردێت. |
| قلب | Inversion | هەڵگێڕانەوە، قڵپکردنەوە |
| قلب الخشب - خشب صميم | Duramen | جەرگەی تەختە- تەختەی بنەڕەتی- بەشی ناوەڕاستی تەختەی درەخت کە ڕەنگەکەی تۆخە و پتەوە |

| | | |
|---|---|---|
| قلة - نقص | Littleness = Smallness | کەمی ، نەبوونی |
| قلة يوريا البول | An-azoturia | کەمی مادەی یوریا( نایترۆجینی) لە میزدا |
| قلث - دجر | Gram = Cow-pea | ماش- گیایەکی کشتوکاڵییە لە کۆمەڵەی پاقلە بەرەکەی خڕ و سەوزی مەیلە و ڕەشە دەکرێت بە چێشت . |
| قلة الحيوانات المنوية | Loligospermia | کەمی سپێرم لە شاوەتدا ( واتە لە ئاوی پیاودا). |
| قلة الكريضات | Leukopenia | کەم بوونی خڕۆکەی سپی لە خوێندا. |
| قلة - نزر | -Penia<br>Oligo- | پاشگرێکە بە مانای کەمی .<br>پێشگرێکە بە مانای کەمی . |
| قلة التغذية | Under nutrition | کەم خۆراکی . |
| قلة اللمفيات | Lympho penia | کەمی خڕۆکە و شلەی لیمفاوی |
| قلة العطش | Oligodipsia | کەمی تینوێتی. |
| قلة الكريات الحمراء | Oligocythemia | کەمی خڕۆکە سوورەکانی خوێن |
| قلة الطمث | Oligomenorrhea | کەمی خوێنی بێنوێژی |
| قلة التنفس | Oligopnea | کەمی هەناسەدان |
| قلة اللعاب | Oligoptyalism | کەمی لیك |
| قلص - تقفع | Contracture | کرژبوونی ماسولکە یان ژێ بە شێوەیەکی هەمیشەیی |
| قلة الكريات البيض | Leukopenia | کەمی خڕۆکە سپییەکانی خوێن |
| قلة اللعاب | Oligoptyalism | لیك کەمی - کەمی لیك |
| قلت - محجر العين | Eye-socket | چاڵایی چاو - ئەو ئێسکە چاڵەیە کە گلێنەی چاوی تێدایە |
| قلح، قلاح - قلح سني | Dental tartar<br>Odontolith | پەنیرە - زەردی ددان ، ئەو بەردەیە کە پەیدا دەبێ لە لینجی ددانەکاندا ، ڕەنگەکەی زەرد یان سەوزە |
| قلح | Agedass | کەری پیر ، پیرەکەر |
| قلز - براس | Brass | داڕشتەیەکە لە چەند کانزایەك بە تایبەتی مس و تەنەکە |
| قلزم - البحر الاحمر | Red sea | دەریای سوور |
| قلس | Drainage | دەرکردنی ئاوی زیادە لە زەوی |
| قلس | Cable = Hawser | پەتی گەورە |
| قلس - تجشؤ | Regurgi | میلنج هێنانەوە |
| قلشين - لفافة الساق | Putty | لەفاف قاچ - قاچ پێچ- دۆلاق- دۆلاخ |
| قلع - اقتلاع | Pulling up, lifting | هەڵکێشان ، دەرکێشان ، هەڵکەندن |
| قلع باليد | Pulling up | دەسکەنە، هەڵکەندن بەدەست |
| قلعة | Citadel = Fortress | قەڵ، قوڵە، باروو |
| قلعة - رخ ( من الشطرنج) | Castle | قەلا لە یاری شەترەنجدا |
| قلع الاسنان | Exodonata | ددان هەڵکێشان، دەرهێنانی ددان، ددان دەرکێشان |
| قلعة طائرة | | قەلایی فڕۆك، فڕۆکەیەکی مەزنە ، بۆمبای قورس هەڵدەگرێت و دەیگرێتە دوژمن . |
| قلف ( للشجرة ) | Bark phloem | توێکڵ ، تیفڵ، کەف : بەی ئاوەوەی توێکڵی قەدی ڕووەك کە خۆراك دەگوێزێتەوە |

| | | |
|---|---|---|
| قلف انجستورا | | توێکڵی ئەنجستورا، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی سەدوو توێکڵەکەی تاڵە لە ئەمەریکای باشووردا دەڕوێت، ئەم توێکڵە لە جیاتی توێکڵی درەختی ( سنکۆنا) بەکاردەهێنرێت هەروەها بۆ بۆن خۆش کردنی مەی بەکاردێت |
| قلفة القضيب - غرلە | Acroposthia = Prepuce, foreskin | پێستی چووك: ئەو بەشەیە لە چووك کە لە کاتی خەتەنەدا دەبڕێت |
| قلف - ختان | Circumcision | خەتەنەکردن |
| قلفونة، قلفونية، لبانة شامي = صمغ الصنوبر | Colophony = resin = Galipot | ١. ڕێسین، زەمقی ڕاتنجی سنەوبەر .<br>٢. بنێشت، زەمقی قەزوان : مادەیەکی ڕۆشنە کەمێك لە ئاو قورسرە |
| قلق ،اضطراب | Anxiety= Worry | نارەحەتی ، بێئارامی، ڕاڕایی، دوو دڵی ، نەسرەوتی، سەغڵەتی، خولیا، کەڵکەڵە، مەراق، پەژارە، پەریشانی، پەرۆایی، پەشۆکاوی.<br>بارێکی دەروونی ناخۆشە لە ئەنجامی کرژبوونی دەمارە |
| قلق عصبي | Norstania | ( نۆرستانیا) پشێوی بیرەوەری خێراهەڵچوون |
| قلق ، غير ثابت | Movable | لەق ، نابەند، تابەنگ |
| قلقاس | | ماسی‌یەکی ڕووباری ئەمریکایی‌یە دەخورێت |
| قلقطار | Colocthar | کۆلکۆسار: ئۆکسیدی ئاسنێکی سوور کە وەکو بۆیە یان سووراو بۆ ئارایشت بەکاردێت |
| قلقاس هندي | Sweet Potato | قەتاتەی شیرین |
| قلقاس ، قلقاس رومي، قلقاس هندي، طرطوفة، عباد الشمس العسقولي ، بطاطة حلوة - الماظة | Jerusalem = Artichoke = Taro = Colocosia= Egyptian Arum = Colocosia Eatable | سێوی بن ئەرز،سێوی بن زەوی، پەتاتەی شیرین ، سێلك : ڕووەکێکە لە هیندەوە داهاتووە ، گەڵاکەی گەورەیە ، گوڵەکەی زەردە، سەلکەکەی لە سەلکی پەتاتە دەچێت نیشاستەی تیایە، بەڵام لە پەتاتە خۆشترە، هەندێ جۆری بۆ ڕەوان کردن و کرم فڕێدان و ترشیات بەکاردێت |
| قلقل، قلقلان - ستابري | Cassia = Foetid-Cassia | گادمە، ڕووەکێکی دەشتەکی‌یە پزیشکی‌یە بۆگەنە دەنکەکەی ژەهرە، درەختێکە لە هەنار دەچێت دەنکێکی ڕەشی لووسی خڕی لینجی هەیە |
| قلقاني كوبة | Starnaenas | جۆرە کۆترێکە ڕەنگەکەی گەنمی‌یە سەری شینە ، ژێر ملی ڕەشە سنگی خەنەیی‌یە دەنووك و قاچی سوورە |
| قلقلة | Alsin | گیایەکی دەشتەکی‌یە لە کۆمەڵەی مێخەك گوڵی ووردی سپی دەگرێت |
| قلقولة، جعل | Geotrupes | گووخلێنگە، جۆرە قاڵۆنچەیەکە پیسایی خل دەکاتەوە |
| قلقديس = راج اخضر | Green Vitriol | زاجی سەوز- مادەیەکی کیمیایی‌یە |
| قلم | | قەڵەمی نوسین |
| قلم العين | Eye stick | قەڵەمی چاو بۆ ئارایشت |
| قلمندر | Calamander | کالاماندەر، تەختەیەکی قاوەیی‌یە هێڵی ڕەشی تیادایە |
| قلنسوة | Cap = Hat = Capoche = Cidares | کڵاو، شەپقە، قۆچکە، کڵێتە |
| قلم | Pencil = pen | خامە، پێنوس، قەڵەم |
| قلم القصب | Reed pen | قەڵەمی قامیش + قەڵەمێك لە قامیش دروست دەکرێت |
| قلم الرصاص | Lead Pencil | قەڵەمی ڕەش ، پێنوس ، قەڵەمی قورقوشم |
| قلم طباشير | Crayon | قەڵەمی تەباشیر ، سپی یان ڕەنگاو ڕەنگە ، |
| قلم الكوبيا - قلم النقل | Copying Pencil | قەڵەمی کوپی، قەڵەمی مۆر: جۆرە قەڵەمێکە کرۆکەکەی مادەیەکی مۆرە لە ئەنیلین و کاربۆناتی مانیزیا دروست دەکرێت ، ڕەنگەکەی جێگیرە |

| | | |
|---|---|---|
| قلم الحبر | Fountain Pen | قەڵەمی مەرەكەب، پاندان |
| قلم النمات | Caelum | قەڵەمی بەردتاش- قەڵەمی پەیكەرتاشی |
| قلم معدني - قلم النجار | | قەڵەمی دارتاشی |
| قلم الزهرة، حامل السمة | Style | نێركی گوڵ، توولی گوڵ |
| قلم الشمع | Wax pencil | سلەبۆیە، قەڵەمی مۆم |
| قلم الحديد، قلم حديدي | | قەڵەمی ئاسنگەری ، ئەسكەنە، سمۆ، گەزن- ئەو قەڵەمەیە كە دار و ئاسنی پێهەڵ دەكوڵرێ ، سەنگتاش |
| قلم الريش | Quill | قەڵەمی پەڕ- ئەو بەشەی كە لە پێستدا چەقیوە |
| قلم الحاجب | Eyebrow stick | قەڵەمی برۆ، بۆ ئارایشت |
| قلم الشفة = قلم احمر الشفاة | Lipstick | قەڵەمی لێو |
| قلم الكحل | Kohl stick | كلچێوك، كلچیڤ، قەڵەمی كل بۆ ئارایشت |
| قلمبر | Clumber | سەگێكی پەل كورتە( كەلەمبەر) |
| قلم نباتي للتكثير طعم | Graft = Slip | قەڵەم ، پێ، نەمام |
| قلم | Calamus | قەڵەمی نوسین- پێنوس |
| قلمية | Macrostylis | دەوەنێكی بۆن خۆشە بۆ ڕازاندنەوە بەكاردێت |
| قلنسوة الجذر | Root cap | كڵاوی ڕەگ |
| قلنسوة المعدة - ذات التلافيق | Plexus = Reticulum = Omasum | كڵاوی قازی ، بەشێكە لە گەدەی گیانداری كاوێژكەر- بەشی سێهەم لە گەدەی گیاندار |
| قلنسوة البلوط = قمع البلوط | Copule | جەوت، جەفت، كڵاوی بەڕوو |
| قلنسوة ، ارسوسة | Brain-pan | كڵاو، تەقیلە، كلێنە، ڕووەكێكی ناوچە گكەرمەكانە گەڵاكەی دەنرێ لە دووەڵ |
| قلنسوة الراهب ، ونيت ، خانق الذئب، قاتل النمر ، بيش اقونيطن | Aconite = Monkshood = Wolf bane = Aconitum = Evonymus | گورگ خنكێن، شیلان، ڕووەكێكی دەشتەكییە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە و پزیشكی بەكاردێت ، گەڵاكەی هێلكەییە ، گوڵەكەی ئەرخەوانییەكی تێرە مادەیەكی ژەهرینی تیایە لە ڕەگەكەیدا پێی دەووترێت ( ئەكونتین) |
| قلنسوة الموت، عيش الغراب | Death cap | قارچكە مارانە، جۆرە قارچكێكی ژەهرینە- قارچكە گولانە |
| قلنسوة صوفية | | كۆلۆز |
| قلنسية | Collinsia | ( كۆلنیسیا) : گیایەكی دەشتەكی و كشتوكاڵییە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە ڕەنگی لێدەردەهێنرێت ، گوڵی بنەوشەیی یان شین یان ئەرخەوانی یان سپییە |
| قلنباق ، رشدية | Caramba = Carambola | ( كارامبا) درەختێ:ی ناوچە گەرمەكانە ، گەڵاكەی ئاوێتە و پەڕییە، بەرەكەی هێلكەیی وبۆن خۆش و زەردە، كەمێك تفتە دەخورێت |
| قلو، قلي | Alkali | قلیە ، سۆدەی داخكەر ، سۆدیۆم هایدرۆكساید لە دروستكردنی سابوون و قوماش و كاغەزدا بەكاردێت |
| قلوي | Alkaline | قلیەیی ئەلكالی ، ئەو ئاوێتەیەیە كە ئەگەر لە ئاودا توایەوە گیراوەیەكی ئەلكالی لێپەیدا دەكات بە تایبەتی سۆدیۆم هایدرۆكساید و پۆتاسیۆم هایدرۆكساید |
| قلوية | Alkallinity | ئەلكالێتی ، بە پێچەوانەی ترشێتییەوە |
| قلوية الدم | Alkalemia | قلیەیەتی خوێن |

| | | |
|---|---|---|
| قلويات عضوية | Orgonic-alkaline | ئەلكالیە ئەندامییەكان ، قلیە ئەندامییەكان |
| قلويـــد، قلويـــدات = قلواني - شبه قلوي | Alkaloid = Alcaloid | نیمچە قلیەیی ، بریتییە لە ئاوێتەیەكی ئەندامی سروشتی كە لە ڕووەكدا هەیە وەكو ( پایریدین) زۆربەی نیمچە قلیەییەكان بە شێوەیە مادەیەیك ڕەقی كریستالین ، هەندێكیان سووكن زۆر دەبن بە هەڵم ، هەندێكیان بە شێوەی جەوین( زەمەقان) نیمچە قلیەیی نایترۆجینی تیایە نمونەی ئەو ڕووكانەی كە نیمچە قلیەییان تیایە وەكو بیبەر و سینكو ناوخشخاش |
| قلوب كاذبة | | دڵە درۆزنەكان، وەكو لە هەندێك گیاندار دا هەن |
| قلوص | Young Bustard = Young She Camel | ١. بەچكەی چێرك. ٢. بەچكە وشتر ( مێ) |
| قلومية | Collomia | كولومیا : ڕووەكێكی گوڵدارە بەرمەكەی لینجە |
| قلوقة - كولونيا - سـنيا كاذب ، | Bladder-senna = | كۆلۆنیا - سینەمەكی یە درۆزنە |
| قلوص - متقلص | Contractile | گرژبوو- دەشێت بۆ گرژبوون |
| قلو، قلي | Frying | سووركردنەوە ، سوورەوەكردن |
| قلي البيض | Madley a fried egg | سووركدنەوەی هێلكە لەناو ڕۆندا |
| قلـي - اشـنان، حرض | Galss wort = Salsola = Soda ash = Solt wort = Sallcornea | ئەسپۆن - قلیە- گیایەكە لە قەراغ دەریادا دەروێت خۆی سوێدەی شتێن لێدەردەهێنرێت |
| قلي - محلول القلي | Lye | ئاوی قلیە= گیراوەی قلیە بۆ شتن و دروستكردنی سابوون بەكاردێت |
| قليل | Little-small | كەم ،كەمێك، چك، چكێك ، تۆز، تۆزێك، ئەختێك، ئاستەم، پیچەك |
| قليل - نزر | Oligo- | پێشگرێكە بە مانای كەم یان كەمی |
| قليل الحليب ( للحيوان) | | بێژو، بیزگ ، عەبرەش، ئەبرەش، جیڕ، كەم شیری |
| قليل الدهن | Lean | هەر خۆراكێك چەوری كەم بێ وەكو شیر |
| قليف | Dried fruits | میوەی وشك كراوە وەكو قەیسی |
| قليعي - بلق القلع | Stone chat = Whincha Wheater | چۆلەكەی بەرد، چولەكەیەكی بچوكی بەڵەكە زۆر لەسەر بەرد دەوەستێ |
| قليعي احمر | Whinchat | چۆلەكەی بەردی سوور- باڵندەیەكی دەنگ خۆشە |
| قليقلة - سبرغولة | Spurry | گیایەكە لە كۆمەڵەی مێخەك ، گوڵەكەی وورده هەندێكی بۆ لەوەڕ باشە |
| قليدية | Callidium | ( كالیدیەم): مێروویەكی جوانە شاخۆچكەكانی درێژن |
| قليم = مرقم | Stylus | قەڵەموزكە= ئامرازێكە وەكو قەڵەم نووكەكەی باریكە لەسەر تەبەقی مێو (مۆم) شتی پێدەنوسرێت |
| قماءة = قزمية - مذامة | Nanism = Cretinism = dwarfism | سیخینی ، گرگنی، كورتە بنەیی- بستەباڵا ئەخۆشییەكی زگماكییە لە ئەنجامی كەم دەردانی بۆ لە لووی پایرۆیدەوە ، گمشەكردنی لەش و ئێسك |
| قمار | Gambling | قومار ، یارییەك لەسەر پارە بكرێت |
| قماح | Corn Chander | عەلاف- گەنم فرۆش |
| قماط | Swaddle | قومات، مەلۆتكە، قۆناغە، پارچە قوماشە بۆ پێچانەوەی منداڵی ساوا |
| قماطة = حناك - مشهرة | Pillory | ئامرازێكی ملی تاوانباری تێدەخرێت بۆ بڕینەوەی |
| قماط = سفاد الطير | Reproduction-of the birds | جووت كردنی باڵندە ، بەسەراتسین |

| | | |
|---|---|---|
| قماش خام | | جانگ ، چاو |
| قماش | Stuff= Textile | قوماش ، کوتاڵ ، کاڵا، پەڕۆك |
| قماش صوفي | Woollen good | قوماشی خوری |
| قمامة - نقابة - مزبلة | Refuse<br>Ordure of City | سەرنوێلك، زبڵکوان، زبڵخانە |
| قماش الفانلة | Flannel | فانیلە ، قوماشی فانیلە |
| قماش اصطناعي | Synthetic-fabric | قوماشی دەرستکرد |
| قماش - تاجر اقمشة | Draper = clothier | بازرگانی قوماش |
| قمـــام، مـــرد ، اس، عمـــار، حبـلاس، حمبـلاس، مرسـين، حلموش، احمام | Cow berry =<br>Whim berry =<br>Bilberry | مـۆرده، جـۆرەدار و دەوەنێکـە گـەلێك جـۆری هەیـە گوڵـی سـپی یـان ئەرخـەوانی دەگرێـت ، بەرەکـەی بنەوشـەیی یـان سـوور و هـەندێك جـار سپییە، گەڵا و گۆڵەکەی مادەیەکی چەوری بۆن خۆشی لێ دەردەهێنرێت پیێ دەووترێت ( مایرتول) بۆ مەبەستی پزیشکی |
| قمال = مقمل | pedleulosis= Lousy | ئەسپیۆن= کەسسێك ئەسپیێ زۆر لە لەشدا بێت |
| قمة الراس | Top Summit<br>Crown of Head | بۆلك، تەپلی سەر ، تەوقەسەر |
| قمة - ذروة | Apex = Vertex = Crest = Peak =<br>Tip = Top = Summit | لوتکە ، پۆپە، نوك، تەپڵە |
| قمة الموجة | Wave Crest | لوتکەی شەپۆل |
| قمة الكتف | | قەلا دۆشکان |
| قمة الغصن | | سەرلق ، سەرپەل، سەرتەرز، سەرتا |
| قمة الجبل | Summit= Top hill | لوتکەی شاخ، قوتکەی کەل، زینووی گرد، قامی کێو، سەرکەل |
| قمح = حنطة - بر | Wheat | گەنم ، دانەوێلەیەکە ئاردی لێدروست دەکرێت بۆ نان |
| قمح البقر - نقم - سرازان | Buck-Wheat | گەنمی ڕەش گوڵ - جۆرێکە لەگەنم دەنکەکەی ڕەشە |
| قمـــح رومـــي ، علس، خندروس | Spelt Wheat =<br>Dinkel-Wheat | گەنمی رۆمی |
| قمح بولوني | Polish Wheat | گەنمی پۆلۆنی |
| قمح ثخين، قمح عربي | Humpy-grlaned wheat =<br>Turgid Wheat =<br>Rivet Wheat | گەنمی دەنك ئەستوور |
| قمح هندي - ذرة | Corn | گەنمەشامی |
| قمح مشوي | | قەرەخەرمان |
| قمحية = دوسر | Aegilops | دانوولە ، گەنمەکوتاو ، دانیك |
| قمحة | Grain | دەنکە گەنم :<br>١. بەری ڕووەکی دەغڵ و دان وەکو گەنم پەلەتۆوی تیادایە .<br>٢. بچووکترین یەکەی کێش لە ڕژێمی مەترییدا دەکاتە ( ٠,٠٦٤٨ ) ی گرامێك |
| قمدوحة | Inion | گرێ ی پشتە مل |
| قمة حادة، نتؤجاد | Piton | لوتکەیەکی تیژ |
| قمي | Topical | لوتکەیی= شتێك پەیوەندی بە لوتکەوە هەبێت. |
| قمراء = ضوء القمر | Moolight | تریفە ، ڕووناکی مانگ |

| | | |
|---|---|---|
| قمرة - حجرة في سفينة | Cabin | كابينه= ژوورێك له شهمهندهفهر یان فرۆكه یان پاپۆر |
| قمراتي = زجاج | Glasier | شووشهچی ، ئهوانهی به شووشه كاردهكهن |
| قمير = مقامر | Gambler | قومارچی ، ئهو كهسهی كه یاری قومار دهكت |
| قمر شمسي | Lunisolar | مانگ خۆری، ههر شتێك پهیوهندی به مانگ و خۆرهوه ههبێت |
| قمر | Moon | كاوت، مانگ، ههیڤ، تهنێكی ئاسمانییه به دهوری یهكێك له ئهستێره گهورهكانا دهسوورێتهوه ئهو مانگهی به دهوری خرۆكی زهویدا دهسورێتهوه و ئهم مانگه نیمچه خره تیرهكهی ( ٣٤٧٨) كم دهبێ ، هێزی ڕاكێشانی ٦/١ ی هێزی ڕاكێشانی زهوییه كێشكهی ٨/١ ی كێشی زهوییه ، خهستییهكهی ٣/٥ ی خهستی زهوییه ههوای لهسهر نییه . |
| قمر - تابع | Satellite | سهتهلایت، مانگ - پاشكۆ - پاشكۆی زهوی، ههر ئهستێرۆك یهك به دهوری ههسارهكاندا بخولێتهوه وهكو مانگ به دوری زهویدا. |
| قمر صناعي | Artificial-satellite | مانگی دهستكرد، دهسگایهكه كهشتییهكی دهستكرده به هۆی ڕۆكێتهوه له هێزی ڕاكێشانی زهوی دهكرێته دهرهوه، بۆ ئهوهی به دهوری زهویدا یاخود به دهوری ئهستێرهیهكدا بسورێتهوه وه گهلێك ئامرازی تیایه وهكو : ئامرازی وێنهگرتن و دۆزینهوهی تیشك و تۆماركردن و لاسكلكی و كامێرای تهلهفزیۆنی و شانهی ڕووناكی وه پاتری بۆ كۆكردنهوهی زانیاری دهربارهی ههواو بۆشایی دهرهوه و ئهستێرهكان و ناردنی ئهو زانیاریانه بۆ سهر زهوی ، یهكهم مانگی دهستكرد له لایهن یهكێتی سۆڤێتهوه له ٤/ ئۆكتۆبهری /١٩٧٩ داهێنرا كێشهكهی ( ١٨٤) ڕهتڵه. |
| قمــر التفــاح = جرب التفاح | Lenticel spotting = Apple Scald | گهری سێو : نهخۆشییهكی ڕووهكی یه تووشی سێو دهبێت پهڵهی بچووكی قاوهیی لهسهر پهیدا دهبێت |
| قمر تلفزيوني = قمر صناعي للاتصالات | Telestar | تهلستار، مانگی تهلهفزیونی |
| قمر الدين | Sheeted apricot | نانهقهیسی ، جۆره نانێكه له قهیسی دروست دهكرێت تامهكهی ترش و شیرین و خۆشه |
| قمري | Lunar | مانگی ، ههیڤی ، كهوانهیی |
| قمرية | | كهپری مێو، كهپر |
| قمرية قمري ، ترغلة | Turtledove turtur = rock dove | كۆتره فهقیره، ترنیسق، كۆتره باریكه، قومری ، كهڤ و كورك، فاتنگ، كهنا، بووتاك، جۆره كۆترێكه میلی ڕهش و قاوهیی تیایه ، دهنووكی ڕهشه و پهنجهكانی سووره ، دهنگی خۆشه |
| قمرقنرايد | Waxing moon | مانگی بهرموگهشه: مانگ وهكو له زهوییهوه دهبینرێت له مادهی نێوانی مانگی یهك شهوه و مانگی چوارده ههتادێت ڕووهكهی گهورهتر دهبێت |
| قمرية، حب الهلال ، شم الحوت | Moon seed = Lunaria = Money flower | ڕووهكێ:ی كهپرییه زۆری دهشتهكی و ههندێكی بۆ ڕازاندنهوهیه گۆڵهكهی ووردە، بهرهكهی مادهیهكه سركهری لێ دهردههێنرێت بۆ ڕاوهماسی |
| قمرة ، قمر ، شيم | Citharinus = Caranx luna | جۆره ماسییهكی دهریاییه ، ڕهنگهكهی زیوییه گۆشتهكهی دهخورێت |
| قمروش | Glomeris | جۆره مێرووییهكی لوولهییه لهش له ١٢-١٦ ئهلقه پێك هاتووه ڕهنگهكهی قاوهیی له ژێر بهردا دهژی بهشهو دهگهڕێت و به ڕۆژ خۆی خر دهكاتهوه |
| قمرون | | راجع كلمه اربيان ، ڕۆبیان |
| قمروص | Hard almond | بادهمی ڕهق، بادهمی ووشك |

| | | |
|---|---|---|
| قمر - العمى الثلجي | Snow Blindness | بەفر کوێریی- کوێر بوونێ ی کاتی یە، بە هۆی ڕەق بوونـەوەی تیشـکی خۆر لە بەفردا |
| قمر کاذب | Mock Moon | مانگە درۆزنە= وێنەیەکی خەیاڵی مانگە لە نزیك ئاسۆدادەردەکەوێت |
| قمز | Kumiss | ( کوسیس): شەرابێ:ە لە شیری ماین دروست دەکرێت هۆزە مەگۆلییەکان لە ئاوەڕاستی ئاسیادا بەکاری دەهێنن بۆ خواردنەوە |
| قمص = زخرف = شابرة الماء | Hydrometra | ئاو ڕۆشن کەرەوە، جۆرە مێروویەکە بەسەر ئاودا هاتووچۆ دەکات وەکو بیپێۆێت وایە |
| قمص البقول | Leather jacket | مێروویـەکی بچووکـی شـاخ و لاق درێـژی گـەنم ڕەنگـە زیـان بـە ڕووەك دەگەیەنێت |
| قمصة - حورية | Nymph | پێ گورە= بەچکەی کوللە |
| قمص - عدو | Gallop | غار - غاردان |
| قمطر | A kind of stocks | قەمتەر، دارێکە دەکرێـە قاچی تاوانبارەکانەوە |
| قمطرير | | تووش و تاریك |
| قمطة ( النجار) | Clamp | ئامرازێکە وەکو مەنگەنە وایە، دارتاش بۆ بەستنی چەند پارچە تەختەیەك بەیەکەوە بەکاری دەهێنێت بۆ ئەوەی سرێشەکەی وشك بێتەوە |
| قمع | Funnel | ڕەحەتی ، کۆڤك |
| قمع الترشيح | Filter Funnel | ڕەحەتی پاڵاوتن، دامرکاندنەوە، بنبرکردن |
| قمع | Encanthis | سیچکە سلاوە - زیادە گۆشتێك لە گۆشەی چاودا پەیدا دەبێت |
| قمع = كؤيس | Cupules | کاسۆکە: کاسـەیەکی بچووکـی تەختەیە ڕەقـە بـە دەوری بـەری هـەندێك درەخت دا وەکو بەری بەڕوو و فنق |
| قمع = جفت | Cupule | جەوت = کڵاوی بـەڕوو ، کاسـەیەکی بچووکـی ڕەقـی تەختەیـە بەسـەری بەری بەڕووەوە |
| قمع برکاني - تل برکاني | Puy | گردۆڵکەی گرکانی ، شێوەکەی وەکو ڕەحەتی وایە |
| قمع بخنر | | ڕەحـەتی بوخنـەر : جۆرێکـە لـە ڕەحـەتی لـە تاقیگـە کیمیاییـیـەکاندا بەکاردێت |
| قمع بساق طويلة = انبوت مقمع | Thistle Funnel | ڕەحەتی لاسك درێژ |
| قمع فصل | Separating Funnel | ڕەحەتی جیاکردنەوە بۆ جیاکردنەوەی شلەکان |
| قمشة = سوط من جلد | Strap = Cowhide = Awhip made of leather | قامچی یەك بە پێست دروست کرابێت |
| قمعة | Encan this | سێچکە سلاوە، برینێکە لەچاودا پەیدا دەبێت ، زیادە گۆشتێك لە گۆشەی چاوە. |
| قمعية - ديجيتاليس | Digilalis | ( دیجیتالیس) - گیایەکە گوڵی زەنگوڵەیی هەیە |
| قمعولة، برعمة ورقية | Leafybud | گۆپکەی گەڵایی |
| قمع السيكارة | Cigarette-end | قنگە جگەرە |
| قمع ( دواء) | Suppository | شاف= دەرمانێك بخرێتە کۆمەوە |
| قمقمة، قمقم | Case-bottel = Scent Bottel | گومگومە، شەربە، قەرەسو |
| قمل | Louse | ئەسپێ، هەشیشی، مۆریان، سیە، مێروویەکی بێ باڵە لەسەر لەشی مرۆڤ دەژی، خوێنەکەی دەمژێت ، نەخۆشی ڕەشەگرانەتا بلاودەکاتەوە |
| قمل الجبن، سكية الجبن | Tyrogly phusr = Cheese mite | ئەسپێ پەنیر- سێچێکی سپییە دەمەکەی کونگەر و مژۆکە لەسەر پـەنیر و مادەی زیندەوەریی ڕزیوو دەژی |

| | | |
|---|---|---|
| قمل نباتي، عشرة المن = عشرة قرمزية | Aphis = Plant louse | مۆرانەی دار، ئەسپێی ڕووەك ، مێشی گەزۆ، مێرووی گەزۆ- كیسەڵە |
| قمـــل العانـــة = طبوع ، سقامة | Crablouse = Morpio = Phthirus-pubis Body louse | ئەسپێ بەر ، چنگنە، چنگە ، ئەسپێی لەش |
| قمـــل الجـــرب - حمك الجرب | Carcoptidue, Itch mite = Scab Mite | ئەسپێی گەڕیی ، لەسەر ڕەشە وولاخ و مەڕو مالاًت دەژی دەبێت هۆی گەڕیی ووشك |
| قمل الدجاج | Gonlocote =Lice | ئەسپێی مریشك - مێروویەكی نیوباڵیيە لەسەر مریشك و كۆتر دەژی |
| قمل الطيور | Bird lice , Bird mite | ئەسپێی باڵندە |
| قمليات - قراديات | Acaridae | ئەسپێكان- گەنەكان، كۆمەڵەیەكن لە مێروو |
| قمل الخشب | Wood lice | ئەسپێ تەختە ، جۆرێكە لە هەزارپێ |
| قمل الارانب | Haematodipus | ئەسپێ كەروێشك |
| قملة الطحين، خنفساء الطحين | Rust-Red = Flour mite | ئەسپێ ئارد |
| قمل الفيل | Haematomyzus | ئەسپێ فیل |
| قمل الراس، قرعة | Head-Louse | ئەسپێ سەر، ڕەنگەكەی سپییە |
| قمل الماء | Hydrachnida = Water Louse | ئەسپێی ئاویی- مێروویەكی توێكڵداری مشەخۆری ئاوییە |
| قمنانة | Tick (Small) | بەچكە گەنە |
| قمل ذوات الحوافر | Haematopinus | ئەسپێی گیاندارە سمدارەكان |
| قمل الارانب | Haemodipsus | ئەسپێی كەروێشك |
| قموليا - حشيشة الفعتة | Alchemillia-argentea | ئەلچیمیلیا، ئەرجێنتیا- گیایەكە لە كۆمەڵەی گوڵەباخ |
| قميء = قزم | Cretin | گرگن، سیخن، دوو گوردی، بابەعوقرە |
| قمين | Plle | پیل، گرێی مەیاسیری، تەنوور |
| قميء | Certin | گرگن، بارێكە لە لەشدا لە ئەنجامی كەم دەردانی هۆرمۆنی لووی پایرۆیدا (الغدە الدرقیە) پەیدا دەبێت لە قۆناغی مندالی و لاوێتیدا دەبێتە هۆی كورتە بالایی و عەقل كەمی و زبربوونی پێست و موو بە دەرمانی پایرۆكسین چارەدەكرێت |
| قمين - اتون | Kiln = Furnace = oven | كوورە، تەنوور |
| قمين الجير | Line kiln | كورەی گەچ دروستكردن |
| قمين الاجر | Brick-kiln | كوورەی خشت دروستكردن |
| قميحة | | قەرەخەمان ، قاووت، جۆرە خواردەمەنیيەكە ، گەنمی برژاوی هاڕراو كە دەكرێت بە چێشت. |
| قمير | Moonlet | مانگۆكە- مانگێكی بچووك |
| قميص | Shirt = Dayshirt, Jersey = Camlse | كراس |
| قميص بنت الملك | Clematis-flammula | دەوەنێكی كەپرە ئاركێكی ژەهرینی سووتێنەر تیایدایە گوڵەكەی بچووك و ڕەنگ خاكییە |
| قميصول ، قميص التقييد | Camisole | ١. ئەتەگ- كراسێكی ژێرەوەی ژنانەیە قۆلی نییە<br>٢. چاكەتێكی ژنانەی كورتە- چاكەتۆكە |

| | | |
|---|---|---|
| قميص مسرول | Cami-Knicer | كراسى به پانتۆڵ ، بەرگێكى ژێرەوەى ژنانەى يەك پارچەيە، لە كراسێكى بێ‌قوڵ و پانتۆڵێكى كورت پێك هاتووە هەتا سەر ئەژنۆ دێت |
| قميص تحتاني | Petti Coat = Chemise = Slip | ژێركراس، نيفستان، ئەتەك، كراسێكى درێژى بێ‌قوڵە لە ژێرەوە لەبەر دەكرێت |
| قميز = قميشة | Brick Kiln | كورەى خشت |
| قميص النوم ( للرجال)، دشداشة | Night shirt | كراسى شەو بۆ پياوان - دشداشە |
| قميص النوم = منامة | Night gown = Bed gown | بيجامە |
| قميص بخاري | Steam jacket | كەراسى هەڵمى - چاكەتى هەڵمى - ديوارە دووبەرەكەى هەندێك دەزگا كە هەڵم بە نێوانياندا تێپەر دەكرێت بۆ گەرم كردنى ناوەڕۆكى ئەو دەزگايە |
| قميم - بقول = مييسة | Dried Vegetables | سەوزەى ووشكرا وە |
| قن ، خم، مزقة | Hen house = Coop Hutch | كولانەى مريشك |
| قنا - قصب الهند | Flowering-reed canna | قاميشى گوڵدار، ماروزان ، ڕووەكێ:ى سەلكدارە قەدەكەى قايمە ، گەڵاكەى گەورە و هيلكەييە ، گوڵەكەى هەرەنگيە سوور يان پەمەيى يان زەردە بۆ ڕازاندنەوەى باخچەكان بەكاردێت هەروەها ڕەنگێكى سووورى لێ‌دەردەهێنرێت هەندێكى سەلكەكانى گەور و بۆ خواردەمەنى بەكاردێن لەە ناوچە گەرمەكاندا دەڕوێت |
| قنا | Leptorrhinia | لووت پانى |
| قناطر الدم، دم الاخوين | Dragon blood tree = | خوێنى دوو براكە ( راجع دم الاخوين) . |
| ، قناية | Bract = Eole | قنچكى گوڵ، گەڵاكەى ئەستوورە دەورى گوڵى داوە |
| قناب | Perionyx | بێخى نينۆك، گۆشتى دەوروپشتى نينۆك |
| قنابية - اوستريا | Lever-wood = Iron-wood | درەختێ:ە تەختەكەى ڕەقە و قورسە لە بەرى كاژ ( سنەوبەر) دەچێت |
| قناة- رمح | Spear-lance | ڕم |
| قناة البندقية ( سبطانة) | Barrel | لوولەى تفەنگ |
| قناة بالوعية - فجوة بالوعية | Gat | ئاوەڕۆ |
| قناة - ترعة | Canal = Duct = scopper = Channel | ئۆكەند، جۆگە، كەلو، بۆرى، جۆك، جۆگالە |
| قناة الصفراء ، قناة صفراوية | Bile Canal = Biliary-canal = Bileduct | بۆرى زراو ، ئەو بۆرييەى كە لە جگەر دەردەچێت شلەيزراو دەبا بۆ توورەكەى زراو يان ڕيخۆڵە باريكە |
| قناة مائية ، مجرى الماء | Scupper = Agucduct | جۆگا، جۆگە |
| قنال، قناة | Channel, duct, canal | كەنال |
| قنالي | Canali | كەنالى ، ئەو كەنالانەى ( قنوات) كە لەسەر ڕووى هەسارەى مەريخ هەن |
| قناة هضمية - قناة الطعام | Alimentry-Canal = Digestive-Canal | بۆرى هەرس، كۆئەندامى هەرس خواردن |
| قناة سلفيوس المائية | Aqueduct of Sylvius | |
| قناو وولف | Wolfian-Duct | ( الكلية الوسطى) |
| قناة شوكية - قناة فقرية | Rhachidian-Canal | بۆرى برېرە، بۆرى بربرەى پشت |

| | | |
|---|---|---|
| قناة ڤالوب ، قناة الرحم، قناة البوق، قناة البيض | Aqueductof = Fallopius = Fallopian Tube = Oviduct | بۆری منداڵدان ، بۆری ڤالوپ- بۆری هێلکه، ئەو بۆرییەکە هێلکە لە هێلکەدانەوە دەبات بۆ منداڵدان لە لەشی ئافرەتدا |
| قناة الحلمة ، قناة كوڤيري | Cuvierlan duct, mamilla duct | |
| قناة المبيض | Oviduct | بۆری گەرادان = گەراڕۆ- بۆری هێلکەدان |
| قناة البنكرياس | Pancreatic-Canal | بۆری پەنکریاس ، جۆگەی پەنکریاس |
| قناة كبدية | Blastoporlc-canal | بۆری جگەر، جۆگەی جگەر |
| قناة لمفاوية | Lymphatic canal | لیمفەبۆری، لیمفە جۆگە |
| قناة بولية | Urethra | بۆری میز |
| قناة هلالية ( قنوات هلالية) | Semicircular-Canals | جۆگـە کەوانییـەکان لـە نـاوەوەی گوێچکـەدا پـەیوەندیان بـە هەسـتی خۆڕاگرتنەوە هەیە |
| قناة هافرسية | Haversian-Canal | بۆری هاڤرسیە، بۆرییـەکی باریکە ڕووی ئێسك دەگەیەنێتە بە مـەغزی ئێسکەوە پیایدا تێپەڕ دەبێت خۆراك دەبات بۆ ئێسك |
| قناة الحليب | Galactophor | بۆری شیر- شیرەڕۆ |
| قناة منوية | Spermatic duct | بۆری یان جۆگەی شاوەت |
| قناة دمعية | Lachrymal duct | بۆری فرمێسك |
| قناة سمعية - قناة السمع | Auditory-Canal | کونی گوێ، بۆری بیستن |
| قناة ( قنوات) فولكمان | | بۆرییەکانی ڤۆلکمان چەند بۆرییەکە ، بۆرییەکانی هاڤرس لە ئێسکدا دەگەیێنن بە یەکتری |
| قناة زيتية | Oil Duct | بۆری ڕۆن ، بۆری چەوری، بۆرییەکە لە شـانەی هـەندێك ڕووەکـدا هەیـە مادەی چەوری پەرشەوبوو دەردەدات |
| قناة الوقود | Fuel Channel | بـۆری سـووتەمەنی ، بۆشـاییەکی لولـەیی لـە تـەنی کارپێکـەردا ، سووتەمەی تێدەکرێت |
| قناة ناقلة للمني = الاسهر | Vas deferens | بۆری گواستنەوەی سپێرم |
| قناة هنتر | | کەناڵی هەنتەر |
| قناة شعاعية | Radlal Canal | |
| قناة دافعة | Vas Deferens | |
| قناع | Mask | دەمامك= دەماخ |
| قناع واقعي | | دەمامك- کلاوی پارێزەر، کلێتەی پارێزەر ، دەماخ، پێچ |
| قناع التنكر - وجه مستعار | Domino mask | کلێتەی خۆشاردنەوە |
| قناع واقي للغازات = كمامة | Gasmask | دەمامکی گازە ژەهرینەکان |
| قناع النحال | Bee evil | دەمامکی هەنگوین دەرهێنەر |
| قناة هوائية | | بۆری هەوا |
| قناة المرارة ، قناة الموصلة الصفراوية | Cystic-canal = Cystic-duct | بۆری تاڵاو، بۆری توورەکەی تاڵاو |
| قناة الصفراء | Choledochos | بۆری زراو- کەناڵی زراو |

| | | |
|---|---|---|
| قناة اوستاكي = قناة الاذن = نفير | Eustachian-tube | بۆری ئۆستاکی = کەناڵی ئۆستاکی ، ئەو بۆرییەکە لەناو قوڕگەوە دەچێت بۆناو گوێچکە تا پەردەی گوێ بپارێزێ لە تەقین لە کاتی زیاد کەم کردنی پاڵەپەستۆی هەوادا |
| قناوشق - قنة - قنة بارزد | Gum ammonia Galbanum plant | جۆرێکە لە ڕووەکی شملی ئاوکێکی وەمقی لینج لە قەدەکەی دەردەهێنرێت بۆ نەخۆشی سنگ باشە- زەمقی قەتاوشق |
| قنارية - حرشف | Artichoke | چاوبازە، کەرتەش |
| قنادية - زهرة = كندية = المرجان | Coral creeper | گوڵە مرجان - ڕووەکێ ی ڕیشاڵی کەپرییە گوڵەکەی بە شێوەی هێشوی گەورمیە ڕەنگی پەمەیی و ئەرخەوانییە |
| قنال غوتنبرغ | gutenberg-Channel | |
| قناع - حجاب = برقع | Mask = kavl = Velum veil | ڕووپۆش، ، پەچە، سەرکلاو ، سەرپۆش، دەماخ |
| قناص | Hunter = Shooter | ڕاوچی- ئەو کەسەی کە خۆی بۆ نێچیر دەنێتەوە |
| قناية | Rivulet | جۆگە، جۆگا |
| قنب - حشيش | Hemp = Cannabis-Sativa | گوش، حەشیشە، ڕووەکی گوشی هیندی ڕووەکێکە گەڵاکەی پێنج پەلکی هەیە ڕیشاڵی لێدەردەهێنرێت بۆ دروست کردنی پەت، هەروەها مادەیەکی سڕکەری لێدەردەهێنرێت پێدەووترێت حەشیشە( هاشیش) یان (ماریجوانا) |
| قنب هندي، حشيشة الكيف = شاهدانج | Indian hemp = Decan Hemp = Kenaf Hemp = Cannabis sativa | گوش هیندی ، شادانە، بەنگ، چەز، تۆو گوش، گیاکەندر، حەشیشە جۆرێکە لە ڕووەکی گوش دەڕوێنرێت لەبەرئەوە مادە ڕێسنیەی کە لە گوڵەکانیدا هەیە چونکە ئەو مادە ڕێسنییە مادەی حەشیشەی سڕکەر دەردەهێنرێت کە هەندێ کەس دەیکێشێت لەبەرئەوە قەدەغەکراوە و ئەم گیایە وەکو کونجی بە تۆو دەچێنرێت بۆ خواردن لاسکەکەی ماوەیەك لە ئاودا دەخوسێنرێت ئینجا دەکوترێت ڕیشاڵی سپی لێدەردەهێنرێت و دەڕێسرێت بۆ دروستکردنی پەت و گوریس |
| قنب مانيلا، ابق موزليفي | Abaca plant = Manila hemp | گوشی مانیلا ، ڕووەکێکە لە جۆری مۆز لە قەدەکەی جۆرە گوشێك دەردەهێنرێت پەت و قوماشی لێدروست دەکرێت بەری ئەم ڕووەکە بچووك و ترش و شیرینە |
| قنبين | Cannabin | کانابین- ڕێسینێکی ژەهرینە لە ڕووەکی گوشی هیندی دەردەهێنرێت |
| قناة | Quinnat = King Salmon | شاسەلەمون: جۆرە ماسییەکە |
| قنار | Onion set | قەلەمس- سەلکە پیازی وورد بۆ ڕواندن بەکار دێت |
| قناطر الدم - دم الأخوين = شجر دم التنين | Dragon blood tree | خوێنی دووبراکە- درەختێکە مادەیەکی ڕێسینی سووری لێدەردەهێنرێت |
| قنب - حنفاص - خيش | Canvas | حەنفاس- خانفاس: قوماشێکە لە گوش دروست دەکرێت |
| قنب سياحي | Ramie = Romee grass | راجع ( رامی) = گوش سیام |
| قنب كلكوتا، جوت | Jute plant = Gunny-bag = Decan hemp = | جووت - گوش - گوێنی - گیایەکی کشتوکاڵی ڕیشاڵ لە قەدەکەی دەردەهێنرێت بۆ دروست کردنی پەت و توورەکە |
| قنبع - عصافة | Glume | تویکڵی دەنکە گەنم |
| قنب مائي، تيل مائي | Double Tooth = Water-agrimony | گوشی ئاوی، ڕووەکێکە |

| | | |
|---|---|---|
| قنبار- سينابار - زنجفر | Cinnabar | ژەنگبەر، مەعدەنی گۆگردیدی جیوە، ڕەنگەکەی سوورە بۆ بۆیەکردنی ئاسن دژی ژەنگ بەکاردێت |
| قنب | Sheath-Cover | توورەکەی کێری چوارپێ |
| قنبـــو، ذنـــب الثعلب ، ذنبيـة، ابودميم | Foxtail grass = Mouse tial grass = Black grass =Canary grass | دوف مشك، كلكە ڕێوی، گیاکاناری، کلکە مارانە ، جۆرە گیایەکە لە زەل دەچێت |
| قندية | | ڕووەکێکی کەپرییە بەسەر درەختیشدا هەڵ دەچێت جۆرێکی هەیە سوورە زۆر بەرز دەبێتەوە گەڵاکەی گەورەیە لە زستاندا دەردەکەوێ بۆ مەبەستی ڕازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێن |
| قنديل البحر ، رئة البحر ،ميدوزا، سمك هلامي | Sea nettle = Jelly-fish = Medusoid | چرای دەریا، مەشخەڵی دەریا، ماسی لینج ، میدۆسا، جۆرە گیاندارێکی ساکارە لە قەراغ دەریادا دەژی ، ئەندامێ ی هەیە وەك چزوو وایە دەدات بە دوژمنەوە زۆر جار دەبێتە هۆی کوشتنی گیاندایر تر تەنانەت مرۆڤیش، شێوەکەی لە زەنگۆڵە دەچێت شاخۆچکەی زۆری پیادا شۆڕبۆتەوە |
| قنـدول ، دارشيشـحان ، عود البرق | Spiny broom = Spiny Cytisus = Caly Cotome | دەوەنێکی دەشتەکی دڕکاوییە ، گەڵاکەی ئاوێتە و بچووکە و گوڵەکەی زەرد و بۆن خۆشە بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان دەڕوێنرێت |
| قندوس | Coendus | جۆرێکە لە سیخور لەش و سەری گەورەیە لەناو دار و درەختدا دەژی. |
| قندس، قندر، كلب الماء ، بادستر، بيدسنر ، حارود | Beaver = Castor | سەگلاو، گیاندارێکی شیردەری ئاویی قرتێنەرە ڕەنگی سوورێکی تۆخە پێستەکەیس بەنرخە بە ددانی لقی درەخت دەبڕێتەوە و هێلانەی لێ دروست دەکات. |
| قندس مسكي ، منك | Mink | جۆرێکی گەورەیە لە سەگلاو مەلەوانە پێستەکەی قاوەیی و بەنرخە. |
| قندس عملاق | Giant beaver | سەگلاوی مەزن ، گیاندارێکی قرتێکەوتووە |
| قنبز، شهرانج | Hempseed | تۆوی گوش، شادانە دەدرێت بە باڵندە هەروەها جۆرە ڕۆنێکی لێ دەردەهێنرێت. |
| قنبر | Blue fish | ماسییە شینە- جۆرە ماسییەکە |
| قنبلة ضد الاشخاص | Anti-personal shell | بۆمبای دژی زەلام- بۆمبای دژی مرۆڤ |
| قنبلة تنوير | illuminating shell | بۆمبای ڕووناك كردنەوە ، لەشەودا بۆ ڕووناك كردنەوەی شوێنی دوژمن بەکاردێت. |
| قنبلة مدفع | Cannonball | گوللە تۆپ- بۆمبای تۆپ، بۆمبایەك لە تۆپەوە بهاوێژرێت |
| قنبلة - قنبرة | Bomb = Shell | بۆمبا، هاوێژراوێکە ئاخنراوە بە تەقەمەنی وەکو باروت گەلێك هەیە ، سوتێنەر و میکرۆبی و ئەتۆمی و ژەهرینی... هتد |
| قنبلة صاروخية | Rocket bomb | بۆمبای ڕۆکێتی |
| قنبلة حارقة | Napalm | ( ناپاڵم) بۆمبای سوتێنەر- بۆمبای ناپاڵم |
| قنبرة ، علعل، صعوة، قبرة - قبعة - ابوقولع | Sky lark = Lark | کلاوکوڕە، سوفیە قیتە، قازەلاخ، جۆرە کلاونە |
| قنبرة الصحراء - مكاء | Bifasciated lark = Desert lark | کلاوکوڕەی بیابانی |
| قنبر ام ، قنزعة سوداء | Dark-crested lark | کلاوکوڕەی کلاوڕەش |
| قنبرة الماء | Turn stone | باڵندەیەکی ئاو ی بچوکی لاق درێژی بەڵەکە |

| | | |
|---|---|---|
| قنبرة امزنجية | Grey lark | کلاوکورەی بیانی |
| قنبرة هندية = حمر | Indian lark | کلاوکورەی هیندی |
| ذالوع الغياض = قنبرة الشجر | Wood lark | کلاوکورەی درەخت |
| قنبلة طائرة = قنبلة الطائرات | Flying bomb | بۆمبای باڵدار |
| قنبلة دخان | Smoke shell | بۆمبای دووکەڵ |
| قنبلة ضد الدبابات | Antitank shell | بۆمبای دژی تانك |
| قنبلة فسفورية | Phosphorous shell | بۆمبای فۆسفۆری : بۆمبایەکە مادەی سپی فۆسفۆری تیدایە زمانەیەکی کاتی تێدایە |
| قنبلة كيماوية | Chemical Shell | بۆمبای کیمیایی |
| قنبلة نجمية | Star shell | بۆمبای ئەستێرەیی : بۆمبایەکە مادە کیمایی تیدایە کەتەقی دەسوتێت بە مادە کیمیاییەکەی بە گڕێکی پرشنگدار دەسوتێت بۆ ڕووناك کردنەوەی نیشان لە شەودا |
| قنبلة تنوير | illuminating | بۆمبای ڕووناك کردنەوە لە شەودا ، بۆ ڕووناك کردنەوەی نیشانەی دوژمن بەکاردێت. |
| قنبلة هيدروجينية | Hydrogen bomb | بۆمبای هایدرۆجینی بنچینەیی ئەم بۆمبایە یەککگرتنی گەرمیی ناوکییە واتە دەستەبەرکردنی وزەی ئەتۆمی لە ئەنجامی یەککگرتنی ناوکۆکەکانی (نویات) توخمە سووکەکان لە پلەیەکی گەرمی زۆر بەرزدا ، لە لایەنێکی تیورییەوە گەورەترین بڕ لە وزە ئەوەیە کە لە ئەنجامی یەککگرتنی دیوتیریوم و تریتیۆنەوە پەیدا دەبێت |
| قنبلة عنقودية | Cluster-bomb | بۆمبای هێشوویی |
| قنبلة موقوتة | Temporary-bomb | بۆمبای کاتی |
| قنبلة يدوية | Hand grenad | بۆمبای دەستی ، نارنجۆك، بۆمبایەکی بچووکە پڕە لە تەقەمەنی بە دەست هەڵدەدرێت کە بەر شتێك دەکەوێت دەتەقێتەوە |
| قنبلة هايدروجينية | Hydrogen bomb | بۆمبای هیدرۆجینی |
| قنبلة ذرية | Atom bomb | بۆمبای ئەتۆم لە کانزای یۆرانیۆم دروست دەکریٚ ، بۆمبایەکی زۆر ترسناکە بۆ کوشتن و سوتاندن و ڕووخاندن ، چەکێکی جەنگی توقێنەرە پشت بە کارلێکی زنجیرەیی ئەو مادە تیشکدەرانە دەبەستێت کە لە ئەنجامی لەت بوونی ناوکییەوە پەیدا دەبن وەکو سەرچاوەیەك بۆ وزە |
| قنبل | Scarlet-mallow | دار و دەوەنێکی ڕازاندنەوەیە لە کۆمەڵەی تۆڵەکە، گوڵ کەیس گەورە و پەمەیی یان ئەرخەوانییە یان سوورە ، بەرەکەی چوار لەتکەیە تۆوەکەی تووکنە |
| قنبيط | | راجع كلمه قرنبيط |
| قنبيل ، ورس | Kamala-tree | دەوەنێکی ناوچە گەرمەکانە لە بەرەکەی ڕەنگێکی سووری لێدەردەهێنرێت |
| قنبلة نيوترونية | Neutron bomb | بۆمبای نیوترۆنی - بۆمبایەکی هایدرۆجینی بچووکە دەتوانرێت بە هۆی بۆمبایەکی ئەتۆمی ( گەردیلەیی) بچووکەوە بتەقێنرێت لە کاتی تەقیندا بە زۆری شتومەکی مادە وەکو خانووبەر بە ساغی دەمێنێتەوە ، بەڵام زیندەوەر بە تایبەتی مرۆڤ لەناو دەبات بە هۆی ئەو تەوژمە تیشکدارانەوە کە لێی پەیدا دەبێت و بریتییە لە تەوژمێکی نیوترۆنی مادەی تەقینی بۆمبای نیوترۆنی بریتییە لە تێکەڵاوی هایدرۆجین لە جۆری دیوتیریۆم و ترتییۆم. |

| | | |
|---|---|---|
| قنة الجبل - قمة الجبل | Cyme = Summit | لوتكەی شاخ، سەرەپۆپەی شاخ |
| قنة | Vertex | تەوقی سەری باڵندە ، واتە پشتی ناوچەوانی |
| قنة شائعة ، كلخ - قنة بارزدا | Giant Fennel = Dorema = Galbanum-Plant | شمڵی مەزن- زەمقی بارزەد: گیایەکی دەشتەکییە رەگەکەی ئەیتوومر هەندێك مادەی پزیشکی بە کەڵکی لێدەردەهێنرێت وە لە قەدەکەی ناوکێکی زەمی لێدەردەهێنرێت |
| قنجر | Conger = Congereel | كونجەر ، مارماسییەکی دەریایی گەورەیە |
| قند = مفسل - غدة تناسلية | Gonad | لووی ( گلاندی) زاوزێ |
| قند، قندة، ابلوج ، طبرزد | Sugar-Candy | قەنە ، شەکری قەند، شەکری قەنە، شەکری نەبات، نەبات، هەنگوینی شەکری قامیشی ووشك کراوە بۆ دەنگ نوسان باشە |
| قنديد = باذق | Brandy | براندی ، مەی : جۆرێکە لە مەی لە میوە دروست دەکرێت |
| قندلیة ، قندلي، قسطل هندي | Horse Chestnut = Indian Horse Chestnut | کەستای ئەسپ، دراو دەوەنێکی تەڕ و بڕی جوانە گوڵەکەی بە شێوەی هێشوی زەرد یان پەمەیی یان سوورە ، بەرەکەی هەلوژەییە و پێچاوپێچە توێکڵەکەی درکاوییە، توێکڵەکەی لەگەڵ زەنجەفیل و بیبەر و گوڵا تێکەڵ دەکرێت بۆ نەخۆشی باشە |
| قنديل | Lamp | چرای لەمپا، چرا، قوتیلە، فەنەر، چراپیلکە |
| قنديل كبير | | چلچرا |
| قندق البارودة = كرمانة | Gunstock = Butt | قۆناغی تفەنگ |
| قنز، عظم الكعب ، قنزعة ، رسغ القدم | Astragalus | ئیسکی پاژنە، مەچەکی پێ |
| قنر | Cunner | کەنەر- ماسییەکی دەریایی بچووکە دەخورێت |
| قنزعة ، اغرة - كشة - طرة | Crest = Top Knot = Plumicorn | پۆپنە، کاکۆڵ، کلاوی باڵندە ، پەڕی سەری باڵندە ، بریتییە لە چەند پەڕێکی درێژ بە پشتی سەری باڵندەوە وەکو لە شینە شاهۆ و کلاوکوڕەدا |
| قنزاع - مقتال - راف | Ruff | رەق - جەنگاوەر- باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی مریشك رەنگەکەی قاوەیی مەیلە و سوورە، نێرەکەی بەوە دەناسرێتەوە کە سەرەکەی پەڕی پێوەیە تەوقێکی پەڕ وابەدەوری ملییەوە لە کاتی شەڕ و پەلاماردا گیف دەبێت واتا پەڕەکان قیت دەوەستن |
| قنشيل ، ترغول | Tragalus | گیاندارێکی شیردەری کاوێژکەرە لە ئاسك دەچێت ، شاخی نییە گوێی کورتە کلکی وەکو کلکی بزن بەرزبۆتەوە، رەنگەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە لە دارستانی ناو شاخدا دەژی |
| قنص = اقتناص | Hunting = Shooting | ڕاوکردن |
| قنصل | Consul | شابەندەر ، کۆنسوڵ، قونسوڵ هەر فەمانبەرێك نوێنەری وولاتەکەی خۆی بێت لە وولاتێکی بیانیدا بە تایبەتی کاروباری ئابووری هاولاتیانی خۆی لەو وولاتەدا بیبات بەڕێوە |
| قنصلية | Consulate | قونسوڵخانە، کونسلێتی، کونسوڵگە، نیشتەجێی قونسوڵ |
| قنصور، قلوتة | Bladder-senna tree | دەوەنێکی دەشتەکی پزیشکییە ، گەلاکەی ئاوێتە گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی زەردە ، بەرەکەی لە بیبەر دەچێت شێوەیەکی میزەڵدانی هەیە |
| قنصلي | Consular | کونسوڵی ، هەر شتێك پەیوەندی بە کونسوڵەوە هەبێت |
| قنطار ، منقمن | Quintal = Cantar = Hundred weight = cental | تەغار = قاپان، ١٠٠ رەتڵ ، ١٠٠ پاوەند لە ئەمریکا، ١١٢ پاوەند لە بەریتانیا، ١٠٠ کیلۆگرامە لە فەرەنسا، ٤٤,٩٢ کیلۆگرام |

| | | |
|---|---|---|
| قنطار عربي عامي | Arabic-Quintal | تەغاری مەرعی دەکاتە کێش ی ۱۰۰ رەتڵ، ۱۲۰۰ وەقیلە، ۲٥٦ کیلۆگرام |
| قنطار متري | Metric quintal | تەغاری مەتری دەکاتە ۱۰۰ کیلۆگرام |
| قنطريـــــــون، مرير، مران | Centaurea = Centaury = Brown rayed = Knap weed = Panicum repens = Torpedo grass= Couch panicum | مرۆ= تاڵەمارانە، تاڵۆ، گیادووپشکە، ڕووەکێکی گیایی ساڵانەی دڕکاوی تاڵە لە کەرتەشی دەچێت ، تامەکە تاڵە ، گوڵەکەی لەیلاقیە لەناو کشتوکاڵ و مێرگدا دەڕوێت زیـان بـە کشتوکاڵ دەگەیـەنێت ، ڕەگەکـەی دەرمـانی لێدەردەهێـنرێت بـۆ چـارەکردنی برینـ و ئاوسـانی دەم ، سـەری چڵەکانی تۆ ی پێوەیە لە کلکی دووپشك دەچێت گرێ گرێیە |
| قنطريون بهن، بهمن ابيض | White behen | گیایـەکی ساڵانەی دەشـتەکی پزیشـکییە لـەناو کێڵگـە و زەوی بـەیاردا دەڕوێت گوڵەکەی قرمزیە |
| قنطريون صغير ، مرارة الخش | Earth gall = Fever Wort | گیایەکی پزیشکیـیە ، گوڵەکەی بە شێوەی مێشووی پەمەیـیە ، دەرمانی ئاو دەرمانی کرمی لێدەردەهێنرێت |
| قنطريون عنبري | Corn flower | ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی ئاوێتەکان |
| قنطريون كبير ، عرطب | Great Centaury | گیایـەکی دەشـتەکی پزیشـکیـیە ، گەڵاکـەی ددانـدارە ، گوڵەکـەی شـینە، ڕەگەکەی بۆن خۆشە و تاڵ و تفتە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت |
| قنطرة ميناه | Aqueduct | ئاوبارە، پردێکە لەسەرپایە دانراوە جۆگەی ئاوی بەسەردا دەڕوات |
| قنطرة | Barrages = Viaduct | پردۆکە ، کەمەرە، دەمەنە، پردی بچووك، تاقی کارێز ، پرد، پـر، جـۆرە پردێکە لە شێوەی تاقدا لەسەر ئاو دروست دەکرێت بۆ پەڕینەوە لەبەرد و گەچ و یان چیمەنتۆ |
| قنطرة البريد | Post office bridge | پردۆکەی پۆستەخانە- دەزگایەکە لە چەند بەرهەڵستییەکی کارەبایی و پاتری و گلفانۆمەتر پێك هاتووە بۆ نێوان ئەو بەرهەڵستی کارەباییلنەی کە نەزانراون |
| قنطرة ويستون | Wheat stone-bridge | پردۆکەی ویستون، دەزگایەکە بۆ دۆزینەوەی بەهای بەرهەڵستی کارەبایی |
| قنطـرة فـاروليس - قنطرة فارولي | Bridge of Varolius = Pons Varolii | پردۆکەی ڤارولیس - پردێکە هەردوو بەشەکەی مەژی ( مخيخ) لە مێشکدا دەگەیەنێت بە یەکترییەوە بریتییە لە تۆپەڵێك لە ڕیشاڵی دەماریی لە مێشکدا |
| قنطورس - قنطروس | Centaur= Centaurus = centaurus | ( سێنتارو) ە کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشوورییە |
| قنعار - جهبل | Tragelaphus-gratus | جۆرە ئاسکێکی گەورەی چاخ کورتە لە نزیك زونگاودا دەژی |
| قنعة = كوة الحائط | Look | کونی دیوار |
| قنف | | کونچکەی گەورەی شۆر |
| قنفاشة | Cryptops | گیاندارێکە لە هەزار پێ دەچێت لەشی لە (۲۱) ئەڵقە پێك هاتووە هەریەکە جووتێك پەل پێوەیە |
| قنفذ، انقد ، مدلج ، دارم، دالج، ابوالمـدلج ، عسـاعس، كبكـاب، شوهت، حسيكة، لثلة ، قباع | Hedgehog = Urchin | ژیژك، ژیشك، ژووژوو، ژووژی، ژووژك، ژیژی |
| قنفذ النمل ، نضناض | Echinda = Echidna | ژیشکی مێرووله - ژیشکی مێروولەخۆر |
| قنفذيات الجلد = شوكيات الجلد | Echinoderms | پێسـت ژیشـکی یـەکان- پێسـت دڕکاوییـەکان لقێکـە لـە کۆمەڵـەی گیاندارەکان، هەریەکەیان پێنج پەل لەیەکچووی شێوە تیشکییان هەیە وەکو ئەستێرەی دەریا، ژیشکی دەریا، خەیاری دەریا |

| | | |
|---|---|---|
| قنفــذ البحـــر ، شيهم بحري | Sea-hedgehog = Sea-Urchin = Echinoid = Porcupine-fish | ژیشكی دەریا ، سیخوی دركـاویس ، گیاندارێكـه لـه كۆمەڵـەی پێست دركاوییەكان لەش بە قاوغی تەنكی تورت داپۆشراوە ئەم قاوغانە خڕو قوپاون بە درك داپۆشراون ، دركەكان توانلای جووڵانەوەیان هەیە، گون یان هێلكەدانەكەی بە سوورەوكراوی یان برژاوی دەخورێت |
| قنفذ الماء - سمكة قنفذية | Hedgehoge-fish | ژیشكی ئاوی ، ماسییە ژیشكی، ماسییەكی دەریایی دركاوییە سەری لە سەری ژیشك دەچێت |
| قنفول | Jamaica horse-been = Sowrd been = Jack-been = Canavalia | ڕووەكێكی كشتوكاڵی خشۆكە گەڵاكەی سێ پەلكە ، گوڵەكەی سوور یان قاوەییە ، بەرەكـەی لـە بـەری فاسۆلیا دەچێت دەخورێـت و دەكرێ بـه چێشت |
| قنفذية، اخينوبس | Echinops = Globe thistle | كەرتەش ، ڕوەكێكی دركاوییە |
| قنفــح ، نيـــض، شيهم، دلدل | Porcupine = hystrix | سیخور، سووچەر |
| قنفع | Acomys | ئەكومایس : گیاندارێكی شیردەری قرتێنەرە لـە كۆمەڵـەی مشـك، لەشی بچـووك و لاكێشـەییـیە ، لـە دواوەی پشـتیدا چـەند هێلێـك برژانگـی ئەستووری دركـاوی هەیـە مـێروو و مارمیلكـە و تـۆو و ڕەگـی درەخـت دەخوات |
| قنفشة | Gall-fly | مێشی مازوو= مێرووییەكی بچووكی ڕەنگینە لەسەر ڕووەكی وەكو بەڕوو دەژی و برینداری دەكات و لە شوێنی برینەكە مازوو پەیدا دەبێت |
| قنقن - قناقن | Dowser = Water finder | ئاودۆز- ئەو كەسەی كە شارەزایە لە دۆزینەوەی ئاو و مەعدەنی ژێر زەوی |
| قنقينا - سنكونا = كينا | Cinchona = Peruvian-bark | گەنەگەنە، سنكۆنا، حنیكونا، تویكڵی درەختی سینكۆنا دەرمانی كنینی لێدەردەهێنرێت بۆ چارەكردنی لەرزوتا |
| قنم | Rancidity | خراپ بوون و بۆگەن بوونی ڕۆن و چەوری |
| قن= عبد الارض | Serf | كوێلە - كوێلەی زەوی |
| قنو، كباسة | Recome of dates | هێشوی خورما |
| قنوب | Blossoms buds | |
| قنواتي | | كارێزكەند ، بیرهەڵكەند |
| قنوي، وعائي | Vascular = Ductal | بۆری دار |
| قنومة ، ابوبوز | Mormyrus = Sacred fish | ( مۆرمیرەس) ماسییەكی ڕووباری لاكێشەیە، پـەرەكانی نـەرمن دەمـی بچووكە بەڵام لمۆزێكی باریك هەیـە ، ئەندامی كارەبایی لـەم لاولـەولای كلكیەوە هەیە |
| قنومة | Cowrie = Cowry | سەدەفی كاوری - سەدەفێكی زەردە لە هەندێك وڵاتی ئاسیا و ئەفەریقادا وەكو پارەبەكاردەهێنرێت |
| قنية | Canaliculius = Ductule | كەناڵۆكە- كەناڵێكی بچووك |
| قنينة صغيرة | Phial = Flask | سوراحی ، گومگومە، كەموڵە، بوتڵ . لە شووشە دروست دەكرێت شلەی تیادایە هەڵ دەگیرێت |
| قنينة حجمية | Volumetric flask | بوتڵی قەبارەیی |
| قنينة ضيقة الفوهة | Bottle Narrow mouth | بوتڵی دەم تەسك. |
| قنينة واسعة الفوهة | Bottle Wide mouth | بوتڵی دەم پان. |

| | | |
|---|---|---|
| قنينة الوزن | | بۆتڵی کێشان، دەفری کێشان |
| قنينة قطارة | Bottle droping , weight bottle | |
| قنينة الكثافة | Condensation bottle | کومگومەی پێوانی خەستی ، کەموڵەی پێوانی خەستی |
| قنينة جمع الغاز | Bottle for Collecting gases | بوتڵی کۆکردنەوەی گاز |
| قنينة غسيل | Washing Bottle | سوراحی شتن ، بوتڵی شتن |
| قنينة لقتل الحشرات | Kilner jar | بوتڵی کوشتنی مێروو |
| قنيرة | Pepper | دەلوبیبەر. |
| قنينة وولف | | بوتڵی وولف. |
| قن = سمك القن | Harsemackerel | جۆرێکە لە ماسی ماکسیریك |
| قن الدجاج | Hencoop | کولانەی مریشك |
| عنقود - عذق | Bunch of dates = Cluster | هێشوو. |
| قنينة - زجاجة | Bottle = Glass Bottle | قەتارە ، سوراحی |
| قنينة غسل الغاز | Washing Bottle | بوتڵی شووشە |
| قنينة حجمية | Volumetric flask | |
| قنينة جمع الغاز | Bottle for Collecting gas | |
| قنينة الشراب | Wine bottle | بوتڵی مەی |
| قنينة الحفظ لنماذج | Specimen jar = Bottle Wide neck | بوتڵی کۆکردنەوەی ( پاراستنی) نموونە |
| قنينة كليزن | Claisen Flask | بوتڵی کلیزن، بوتلێکە دوو ملی هەیە بۆ دڵۆپاندنی شلە بەکاردێت |
| قنيصة - حديد | Game | نێچیر ، ڕاوکردن |
| قنيطة | Long worte | گیایەکی دەشتەکی‌یە |
| قنيصة | | راجع (صيد) |
| قهبي، قهبية | Sand-partridge | سوێسکەی لم |
| قهد ، نرجس | Nar Cissus | نێرگز |
| قهرمانة - لونجية | House Keeper | کابان= کەیبانوو |
| قهقب | White-Bormigar | جۆرە باینجانێکە بەرمکەی سپی‌یە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە بەکاردێت |
| قهقرة | Retrogression | گەڕانەوە بۆ دواوە ، نشوستی ، دابەزین لە پایەیەکی بەرزەوە بۆ نزم |
| قهقهة، كركرة | Cachinnation = Loud guffaw = Horselaugh | قیلکە، قیلکە قیلك، قاقای پێکەنین ، تریقە، تریقانەوە ، هاڕەی پێکەنین |
| قهم - سدم - عياف | Loss of appetite = Anorexia | کەمی ئارەزووی خواردن لە گیانداردا |
| قهوائي | Coffee Colour = Brown | قاوەیی، ڕەنگی قاوەیی |
| قهوائي | Coffee shop keeper | قاوەچی، چایچی |
| قهوة= بن | Coffee | قاوە ، ڕووەکێکە بەرمکەی بۆ وورياکردنەوەی مۆخ و بەهێزکردنی گەدە و یارمەتی دانی هەرس و نەهێشتنی برسی بوون و ماندوو بوون بەکاردەهێنرێت |
| قهيقران | Amphisbenus | جۆرە مارمێلکەیەکی بێ‌پەل لوولەیی‌یە لەماردەچێت ، ڕەنگەکەی قاوەیی مەیلە و ڕەشە هێڵی بۆری تیادایە لە ژێر زەوی‌دا دەژی وە بە تایبەتی شارە مێروولە بۆ مسۆگەرکردنی خواردەمەنی |

| | | |
|---|---|---|
| قوادم | Wing primaries = Primary Quills | شاپەر، ئەو پەڕە گەورانەن بە سەری باڵی باڵندەوە ژمارەیان ( ١٠-١١) پەڕە |
| قوادم الطير | Wing Primaries | پێشپەڕەوی باڵندە ، جخ، پەڕی باڵندە، شاباڵ، شاپەڕی باڵندە کە سێ پەڕی درێژە لە هەر باڵێکدا |
| قوام - قامة | Figune, stature | بەژن، باڵ، دیمەن، قەد |
| قوام - نيج | Texture | پەیکەر ، پێکهات |
| قوارض ، قواضم | Rodentia = Glires | گیانداره شیردەر ە قرتێنـەرەکان ، گیاندارە کرۆژەرەکان، گیاندارە کرۆژەندەکان وەکو کەروێشك. |
| قواع، ارنب وحشي ، ارنب بري | Hare | کەروێشکە کێوی ، کەروێشك ، رەنگەکەی قاوەیی یان سپی یان قاوەیی مەیلە و سوورە گوێچکەکانی درێژن |
| قواع - خزز | Buck-hare | کەروێشکی نێر |
| قواد - ديوث | Fancyman = Pimp | دەیوس ، گەواد |
| قواطع ( اسنان) | incisor | برەرەکان |
| قوارة - مغرنة | Scoop = Corer | چەمچە |
| قواطع | Migratory birds | باڵندە کۆچکەرەکان - ئەو باڵندانەی کە تەنها لە وەرزێکدا لە هەرێمێکدا دەبن و لە وەرزەکەی تردا کۆچ دەکەن |
| قوات | Forces | هێزەکان |
| قوات الامن | Security-forces | هێزەکانی ئاسایش |
| قوات برية | Land forces | هێزەکانی زەوی |
| قوات سيارة | Mobile forces | هێزەکانی کەرۆکەکان |
| قوات غير نظامية | Irregular-forces | هێزەکانی غەیرەنیزامی |
| قوات مسلحة | Armed forces | هێزە چەکدارەکان |
| قوات مدرعة | Armored forces | هێزە زرێپۆشەکان |
| قوات مشتركة | Joint Forces | هێزە هاوبەشەکان |
| قوات قتالية | Combat forces | هێزە شەڕکەرەکان |
| قوائم | Limbs | پەلەکانی گیاندار ، پەلەکان |
| قوارت | Omnivora | ئەو گیاندارانەی کە گۆشت و رووەکیش دەخۆن |
| قوازب، برمائيات | Amphibia | گیاندارە تەڕ و ووشکیەکان وەکو بۆق |
| قوانين الغازات | Gas laws | یاساکانی گازەکان |
| قوانين التحليل الكهربائي | Laws of Electrolysis | یاساکانی شیکردنەوەی کارەبایی ، رێساکانی فارادای ( یەکەم و دووەم) |
| قواس | Archer = Bowman | تیر هاوێژ- تیروکەوان باز |
| قوانين هورتون | | یاساکانی هۆرتۆن |
| قوانين الاتحاد الكيمياوي | Laws of Chemical Combination | یاساکانی یەکگرتنی کیمیایی |
| قوانـــين الحركـــة لنيوتن | | یاساکانی نیوتن بۆ جووڵە: ئەمانە سێ سایان زانا نیوتن دەربارەی جووڵە دایناون |
| قوانين الديناميكا الحرارية | Laws of thermo dynamics | یاساکانی پیرەۆدا ینەمکس ئەمانە دوو یاسان دەربارەی گەرمی و ئیش |
| قوباء حلقية | Ringworm = herpes | نەخۆشییە درمە ، بە هۆی مشەخۆری رووەکییەوە بڵاودەبێتەوە لیری شێوە ئەڵقەیی لەسەر پێست پەیدا دەبێت |

| | | |
|---|---|---|
| قوباء الكرم | Vine-Scurf | نەخۆشی‌یەکی ڕووەکی یە لە مێو دەدات |
| قوباء معدية | Contagious | درمە گرمەژنەیی |
| قوباء الركبة | Malanders = Rotten knot | نەخۆشی‌یەکی پێستی‌یە لە ئەژنۆی وولاخ دەدات |
| قوبة الغنم - فرح جمر | Milzbran d and Charbon | ئاگرە، نەخۆشی‌یەکی درمە لە مەڕو ماڵاتدا بلاْودەبێتەوە. |
| قوبة | Sterite | جومگەی سکی مێروو |
| قوبة- قشرة البيضة | Shell | توێکڵی هیلکە دوای هەڵهێنانی جوجکەکە |
| قوبـــع، فقـــاح ، ذعـــرة ، صفراعـون، ابـو فصـادة، ام عجلان ، ام سكعكع، قوبعة، شـقراق، طـير العراقيــب = زيطة، شرقرشرقرق | Wagtail = Motacil | کلك هەڵاْسەنگێنە، کلك هەڵتەکێنە، جۆرە باڵندەیەکە هەمیشە کلکی بەرز ونزم دەکاتەوە وەکو بترسێت وایە |
| قوبعة، سعفة | Tinea | ( تینیا) مۆرانە جۆرە پەپولەیەکی زیان بەخشە به ڕووەك و جلوبەرگ |
| قوبع، ورتك اسفن | Skate | جۆرە ماسی‌یەکە |
| قوبيون ، حوت الجن | Goby | ( گوبـی) جـۆرە ماسـی‌یەکی ڕووبـاری و دەریـای بچووکـەی سـەر زلـە پەرەکانی درکاوی‌یە هەندێکی دەخورێت بەڵام زۆری ژەهرینە |
| قوبيون نهري | Gudgeon | جۆرێ:ە لە ماسی شەبوت |
| قوة برية | Land force | هێزی زەوی بەشێکە لە لەشکر تانك و زرێپۆش بەکاردەهێنن |
| قوة برمائية | Amphibious force | هێزی زەوی ئاویی |
| قوة جوية | Air force | هێزی ئاسمانی - بەشێکە لە لەشکر فرۆکە بەکاردێنن |
| قوة مدرعة | Armoured force | هێزی زرێپۆش بە تانك شەڕ دەکەن |
| قوة مسلحة - قوات مسلحة | Armed Force | هێزی چەکدار |
| قوة بحرية | Sea Force | هێزی دەریایی : بەشێکە لە لەشکر کەشتی ئاسایی و کەشتی ژێر دەریا بەکاردێنن |
| قوبية | Cobaea = Cobea = Cathedral bells = Cups and Saucers | کۆبیا: ڕووەکێکـی کـەپری و ڕازاندنەوەیـە گوڵەکـەی لـە زەنـگ دەچێـت بنەوشەیی‌یە ، بەرەکەی لاکێشەیی‌یە |
| قوة | Power = Potential force | هێز، یارا، تین، توانایی، خووز، زۆر خورتی، ئەو کارەی کە کە دەبێتە هۆی جولاْندنی تەنێك یان گۆڕین خێرایی‌یەکەی یان گۆڕینی ڕێڕەوکەی بە ( داین ) یان ( پاوندال) دەپێورێن |
| قوة التجاذب | Force of gravitation | هێزی کێش، هێزی ڕاکێشان |
| قوة الاضاءة | | هێزی ڕووناك کردنەوە |
| قوة موجهة | Vector | هێزی ئاراستەکراو |
| قوة الارادة | Willpower | هێزی وورە |
| قوة التماسك | Coherance | هێزی یەکگرتن |
| قوة الالتصاق ، قوة استلاصق | Cohesion | هێزی پێکەوەنووسان |
| قوة الشد | | هێزی بەستن |
| قوة بدنية | Physical strength | هێزی لەش |
| قوة الشلالات | White coal | هێزی تاڤگە = خەڵووزی سپی، هێزی ئاوی تاڤگە بۆ ئیش پێکردن بەکاردێت |

| | | |
|---|---|---|
| قوة الماء | Hydrulic force | هێزی ئاو ، بۆ ئیش پێکردنی مەکینە |
| قوة كوريولي | Coriolis force | هێزی کوریولیس |
| قوة نووية حرارية | Thermonuclear power | هێزی ناوکی گەرمی: بڕی ئەو وزە مەزنەی کە لە یەکخستنی ئەتۆیی‌یەوە پەیدا دەبێت ، هایدرۆجینی قورس ( یوتیریوم) یەکێکە لە کەرەسە خاوە سەرەکی‌یەکانی هێزی ناوکی |
| قوة الانبات | Germinal-power | هێزی چەکەرەکردن |
| قوة مغناطيسية | Magnetic force | هێزی موگناتیسی |
| قوة الحافظة ، ذاكرة | Memory | هێزی بیر، بیرتیژی |
| قوة كهربائية مغناطيسية | | هێزی کارەبای موگناتیساوی |
| قوة مركزية | Central force | هێزی ناوەکی - هێزی چەقی |
| قوة صاعقة | | هێزی لێدەر |
| قوة محصلة | Resultant force | |
| قوة طاردة مركزية = | centrifugal force | هێزی دەرپەڕاندن بۆ دەرەوە |
| قوة انتباذية- قوة مركزية | (centripelal) | |
| قوة التكبير ( في المنظار) | Power of telescope | هێزی گەورەکردن لە دووربیندا |
| قوة معادلة | Equilibrant force | هێزی هاوکێش. |
| قوة جاذبة مركزية | Centripetal-force | هێزی ڕاکێشان بۆ ناوەوە |
| قوة جنسية ، نشاط جنسي | Sexuality | چالاکی ڕەگەزیی، هەست کردن بە ئارەزووی خۆشی ڕەگەزیی |
| قوة عاملة | Labour force | هێزی کارکەر |
| قوة بشرية | Manpower | هێزی مرۆڤایەتی |
| قوة احتياطية | Reserve force | هێزی یەدەگ |
| قوة نظامية | Organized-force | هێزی ڕژێمی - هێزی یاسایی |
| قوة انزال برية | Army landing-force | هێزی دابەزینە سەر زەوی |
| قوة برمائية | Amphibious-force | هێزی تەڕو ووشکی - هێزی ئاوی زەوی |
| قوة ضاربة | Striking-force | هێزی لێدەر |
| قوتي = غذائي | Pabular | خۆراکی = هەر شتێك پەیوەندی بە خۆراکەوە هەبێت |
| قوة دافعة = قوة محركة | Impetus = Impulse | هێزی پاڵ پێوەنەر ، هێزی بزوێنەر |
| قوة شرائية | Purchasing force | هێزی کڕیاری ، هێزی کڕین |
| قوة دافعة كهربائية | | هێزی پاڵنەری کارەبایی: پەستانێکی کارەبایی‌یە لە ئەنجامی تێپەڕبوونی تەوژمی کارەبا بە بازنە کارەبایی‌یەکاندا پەیدا دەبێت |
| قوت ، غذاء | Diet = Pabulum = Notriment = food | خۆراك ، بژێو، زاد، خورشت |
| قوتاش، قطاس ، خشقاء، ياك - ثورالتبت | Yak | گاکێوی تیبت، گایەکی کەتەی تووك درێژی کێوی‌یە کلکی لە کلکی وولاخ دەچێت ، ڕەنگەکەی قاوەیی‌یە ، لە تیبت دەژی ، بە فارسی پێ‌دەڵێن ( خۆش گا) وە بە عەرەبیش ( البقره الگیبه) |
| قوري ، ابريق الشاي | Teapot | قۆری |
| قوزي - حمل ، او لحم الحمل | Lamb = Young-sheep | بەرخ یان گۆشتی بەرخ |

| | | |
|---|---|---|
| قوس | Arc = Arch = Bow = Arcus | کەوات، قتا، کەمەر، بەشێکە لە چێوەی بازنە |
| قوسان ( للكلمات و الجمل) | Brackets | جووت کەوانە لە نوسیندا بەکاردێت |
| قوس النصر | Triumphal-arch | تاقی سەرکەوتن ، ئەو تاقەی کەوەکو نیشانەیەك بۆ سەرکەوتن لە جەنگدا بینا دەکرێت |
| قوس غلصمي ، قوس خيشومي | Brnchial-arch | کەوانەی ڕیشەدار |
| قوس فقري | Vertebral arch | کەوانەی بڕبڕەی، ئەو کەوانانەی کە لە بڕبڕەی پشتدا هەن |
| قوس دائرة | Arc | کەوانەی بازنە، کەوانی بازنە |
| قوس القنطرة | Arch | تاقی پرد= عەگادە |
| قوس انعكاسي= قوس المنعكس | Reflex-arc | کەوانەی پەرچی: بریتییە لە ڕێبازی پرتەی دەماریی لە کاتی وەلأمدانەوەی وریا کەرەوەیەکدا ( منبە) |
| قوس نبل = قوس نشاب | Persian bow | تیروکەوان |
| قوس النداف = كربال | Teasing bow | لۆرەك، کەوانەکەی هەلاجی بۆ لێدانی لۆکەکە. |
| قوس و قزح | Rainbow | پەلکە زێرینە ، کەسك وسۆر، کۆلکە زێرینە، ڕووداوێکە لە ئەتمۆسفێردا (جو) ڕوودەدات ، بە شێوەی کەوانەیەك لەهەوردا لەم ڕەنگانە پێك هاتووە بنەوشەیی، چوویتی، سەوز، زەرد، پرتەقالی، سوور، بە هۆی شیبوونەوەی تیشکی ڕۆژەوە لە دلۆپە ئاوی هەورەکەدا کە لە جیاتی سێ پالەیەکی ( ناوێزە) ( موشور) کریستاڵییە |
| قوس سباتي | Caritid arch | خوێنبەرێکە خوێن دەبات بۆ سەر و زمان |
| قوس شرياني | Arterial arch | کەوانەی بۆری خوێنبەر |
| قوس المحراث | Plough-tail | کەوانەی گاسن. |
| قوس عصبي | Nevral arc | کەوانەی دەماریی |
| قوس أخمصي | Plantar arch | کەوانەی بەری پێ |
| قوس وجني | Zygomatic arch | کەوانەی ڕوومەت |
| قوس كهربائي | Electric arc | کەوانەی کارەبایی: ئەو ڕووناکییە و گەرمییە بە تینەی کەڕوودەدات کاتێك لە تەوژمی کارەبا بە بۆشایی نێوان دوو مادەی گەیەنەردا تێپەڕ دەبێت ، بۆ ڕووناك کردنەوەی کیم و پەیداکردنی گەرمی بەرکادێت |
| قوس قوطي | Ogive | کەوانەیەکی لووتکە تیژ |
| قوس ( الرامي) = قلادة | Sagittarius | کەوان ( تیر ئەندان) کۆمەڵە هەسارەیەکە لە لەشەش هەسارە پێك هاتووە |
| قوس الابهر | Aortic arch | کەوانەی شاخوێنبەری خوێن |
| قوط = قطيع من الغنم | Flock of sheep | ڕانەمەر، مێگەلی مەر |
| قوطة | Pottle | سەبەتەی بچووك بۆ میوە |
| قوطة، طماطم، بندورة | Tomato | تەماتە |
| قوطي، نزواة- كوتي | Coati | ( کواتی) : گیانداریکی شیردەری ئەمەریکی بچووکی جوانی تیسکنی گۆشت خۆرە لە سەگ دەچێت ، ڕەنگەکەی قاوەییە ، ژێر سکی زەردە لەمۆزی سپییە لەش و کلکی درێژن لەناو دارستاندا دەژی لەناوچە گەرمەکانی ئەمەریکادا |
| قوطيوس = رتم المكانس | Broom( Cytisus) | درەختێکە گەلأی درێژی شۆڕی هەیە ولێکی زەردە دەگرێت ، گسکی لێدروست دەکرێت |
| قوغ ابيض | Populus-alba | سپی چنار |

| | | |
|---|---|---|
| قوغ اسود | Populus-nigra | ڕەشەچنار |
| قوغ بري ، غرب | Populus = Euphratica | چنارکێویلە |
| قوغ ، حور، غرب | Poplar = Block poplar | ڕەشەچنار ، جۆرێکە لە چنار ، درەختێکی گەورەیە لاسکی گەڵاکانی درێژە، بە قەڵەم زۆر دەکرێت وە بەرەکەی وەك قوتویەکی بچووك وایە ، تۆوەکەی مادەیەکی ئاوریشمی پێوەیە لە کۆمەڵەی بی دەژمێردرێت ، تەختەکەی سوودی لێوەردەگیرێ بۆ دروست کردنی کەل و پەلی ناومال و سووتەمەنی و دروستکردنی کاغەز و شقارتە و تەختەی موعاکس |
| قوفا | Millstone grit | بەردی دەستار، بەرداش = بەردێکیس کونی کونی ڕەش زۆر ڕەقە دەستاری لێدروست دەکرێت |
| قوفز | Klipspringer = Spring buck | ئاسکی بازدەر = ئاسکی گومەتە، ئاسکێکی ئەفریقی‌یە بازێکی جوان دەدات |
| قولحة الذرة | Corn-cob | دارکی گەنمەشامی ، هێشووی گەنمەشامی. |
| قولان ، فراء الهند | Koulan = Indian onager | کەرەکێوی هیندی |
| قولونيا - ماء التواليت | Cologne | فۆلۆنیا- ئاوی تەوالێت ، شلەیەکی بۆن خۆشە دوای ڕیش تاشین بەکاردێت یان بۆ لابردنی بۆنی ناخۆش لە تەوالێتدا |
| قولحة الذرة = عرنوس الذرة | Corncob | دارکی گەنمەشامی = هێشوی گەنمەشامی |
| قولنج | Colic = Colitis | کۆڵنج، برك، سوتانەوەی پەردەی ریخوڵە |
| قوليوس - زهرة الغمد | Colues | گونەکالانە- ڕووەکێکی گوڵدارە |
| قولون | Colon | کولون بەشێکە لە ڕێخۆڵە ئەستوورە |
| قولون صاعد | Ascendence colon | هەل کولون = کۆڵونی سەرکەوتوو بەشێکە لە ریخۆڵە ئەستوورە |
| قولون نازل | Descedence Colon | داکۆڵون= کۆڵونی داکەوتوو بەشێکە لە ریخۆڵە ئەستوورە |
| قولون مستعرض | Transverse | کۆڵونی باری پانی |
| قوم ، شعب | People = Nation | میللەت، نەتەوە |
| قومي = شعبي = وطني | National | میللی- نەتەوەیی، نیشتمانی |
| قوقمان - اذريون | Calendula = Marigold | ئازەرگۆن= قەرەقوز جۆرە ڕووەکێکە |
| قوماندس = مغاوير | Commando | کۆماندۆ، کۆمەڵە سەربازێکن لە نهێنی شەودا لە کەشتی‌یەکانەوە دەپەڕنەوە بۆ زەوی بۆ تێکدان و ڕووخاندنی مەڵبەندە لەشکری‌یەکانی دوژمن لەناو وولاتی خۆیدا |
| قوميسار - مفوض | Commisar | قۆمیسەر- مفەوەزی پۆلیس |
| قوميسير - عميل = وكيل | Commissar | وەکیلی بازرگانی |
| قومي | Nationalis | ماسی‌یەکی دەریایی‌یە شاخێکی هەیە بەسەری‌یەوە |
| قومية | Nationalism | نەتەوەیەتی - میللەت پەروەری - نەتەوەپەروەری |
| قونداقچي | Gunsmith = armourer | چەخماخساز - ئەو کەسەی کە چەك چاك دەکاتەوە |
| قولوني | Colic = Colica = Colonic | کۆڵونی - هەر شتێك پەیوەندی بە کۆڵونەوە هەبێت |
| قومندان - قائد = امر موقع | Commandant | قوماندان= سەرکردە |
| قومية = شعبية = وطنية | Nationality | نیشتمان پەروەریی. |
| قومسيونجي = وكيل اشغال | Commission agent | قومیسیۆنچی- وەکیلی ئیشوکار |
| قومسيون - عمولة | Commission | کۆمیشن- قومیسیون- کرێی دەلالی |

| | | |
|---|---|---|
| قوق | To cackle | گارەگار، دەنگی مریشك. |
| قوق ، بجع، حوصل، سقاء ، جمل الماء - ابو جراب | Pelican | شەقاقوش= باڵندەیەكی ئاویی گەورەی كلك كورتە ڕەنگەكەی سپی یان پەمەییە لـە ژێـر قورگیـدا تورەكەیـەكی گـەورەی هەیـە ماسـی تیـادا كۆدەكاتەوە |
| قوقاة الدجاجة | Cackle | گارەگاری مریشك كاتێك كە لەسەر هێلكە دەكەوێتەوە |
| قوقة = ام قويق | Owl | كوندەبەبووی بچووك |
| قوقحـــان، زبيـــدة، سوسس، شجرة مريم، كحلة، اذريون البر | Crown daisy = Field marigold = Chrysanthemum = Yellow Corn flower = Calendula-Composite | كەركاش ، گیایەكی دەشتەكی و پزیشكی و ڕازاندنەوەیە گوڵەكەی سپی یان زەردە، گەڵاكەی تووكنە |
| قوقاع | Winter-Green | گیایەكە ڕەگەكەی ڕیشاڵییە ، گەڵاكەی هێلكەییە ، گوڵەكەی بە شێوەی هێشوی سپییە |
| قوقيس | Otocoris | جۆرێكە لە كلاوكوڕە دوو پەڕی بەسەرەوەیە |
| قوقش، اكبد، اشبور، صقر ، آكل الحيات | Milvago = Polyborus | مارخۆر ، باڵندەیەكی گۆشت خۆرە ، سەری زلە پەڕ لە پێیە، ڕەنگەكەی قاوەییە ، دەنووكی سەوزی مەیلە و شینە لەسـەر لاشـە و مێروو و مـار دەژی |
| قوقل | Tetraogallus | جۆرێكە لە سۆێسكە گەورەیـە ڕەنگەكەی خۆڵەمێشییە هێڵـی قـاوەیی تیادایە |
| قوقع | Cantharellus | جۆرە قارچكێكی زەرد یان پرتەقاڵی یە ، هەندێكی ژەهرە |
| قوقع، حلزون - بزاقة | Helix = Snail = Pet = Winkle | شەیتانۆكە ، قاقلە جنۆكە- ناخۆنی شەیتان، گیاندارێكی نەرمە لە شوێنی ئاویی و شێداردا دەژی ، دوو قۆچی هەیە بەسەریەوە لە ماوەی زستاندا خۆی لە قاقلەكەیدا مت دەكات و دەمـی قاقلەكەی بـە پەردەیـەكی ووشـك دادەخات لە هەندێك وولاتدا گۆشتەكەی دەخورێت |
| قوقع ليمنيوس | Snail limnaeus | لیمنیۆس - جۆرێكە لە شەیتانۆكە |
| قوقعة ارجوانية | Purple shell | سەدەفی ئەرخەوانی |
| قوقعة مخروطية | Conical shell | سەدەفی قووچەكی |
| قوقعة الاذن | Conchlea | قاقڵەی گوێچكە ، بەشێكی پێچاوپێچە لە گوێچكەی ناوەوەدا شلەیەك و پەردەیەك و كۆتاییەكانی دەماری بیستنی تیادایە |
| قوقعي | Cochlear | قاقڵەیی- هەر شتێك پەیوەندی بە قاقڵەوە هەبێت |
| قوقي ، حريش البحـر - كركدن البحر = نرول | Narwal = Narwhal | جۆرە نەهەنگێكە |
| قوقع مائي | Conch | لەپكەی ئاویی. |
| قونيزة | | جۆرە ڕووەكێكە |
| قونة - ايقونة | Lcur = Image | پارچە مەعدەنێك ناو ناونیشانی لەسەر نوسرابێت |
| قويطي - كريز القدس - فقيش | Winter Cherry | جۆرە میوەیەكە |
| قوي | Strong = Robust | هێزدار ، بەهێز، توند، خورت |
| قوي ، متين | Firm | قایم ، توند |
| قوي البنية | Invigorate | لۆزەندەر ، تێكسماو ، بەهێز |

| | | |
|---|---|---|
| قويم - سوي | Ortho- | پێشگرێکه به مانای ئاسای و ڕاست و دروست دێت |
| قويسة، قويصة = ناعمة - سالفيا | Salvia = Sage | ( سالڤيا) ڕووەكێكی بۆن خۆشه ، قەدەكەی سپییه ، گوڵەكەی پەمەی یان بنەوشەیی و یان شین و یان زەرده لە درزی بەردەكاندا دەڕوێت بۆ مەبەستی پزیشكی سوودی هەیه |
| قوى فاندرفال | | هێزەكانی ڤاندیرڤان : ئەو هێزە لاوازانەی كە لە نێوان گەردەكان( ولیكیولەوكاندا) مادەكان كاردەكەن |
| قوثيرة= كوثيرة | Mandolin | گیتارۆكە- ماندولین- ئامرازێكی موسیقایە لە عودێكی بچووك دەچێت |
| قيء اسود | Melanemesis | ڕەشە ڕشانەوە |
| قيء صديدي | Pyemesis | ڕشانەوە بە كێم و زوخاڵەوە |
| قيء الدود | Helminthe mesis | كرم هێنانەوە لە دەمەوە- كرم فڕێدان لە دەمەوە |
| قيء صديدي | Pyemesis | ڕشانەوەی كیمیاوی |
| قيء الحمل | Emesis gravid arum | ڕشانەوەی ژنی بێزووكەر |
| قيء = قياء | Vomit = Emesis = Emesia = Brash = vomiting | ڕشانەوە |
| قيء الدم | Hematemesis | خوێن هێنانەوە |
| قيافة الاثر - تتبع | Following the Tracks of | بە دووكەوتن |
| قيافة - هيئة | External-appearance | قیافەت |
| قيادة | Command | سەرۆكایەتی -بەڕێوەبەرێتی |
| قيادة عمليات | Operational-Command | سەرۆركایەتی كردارەكانی جەنگ - فەرماندەی كردارەكانی جەنگ |
| قيادة ، رئاسة | Lead = Guidance = Lead ship | پێشەوایی، پێشەنگی، سەرۆكی، سەرۆكایەتی، سەركردەیی |
| قياس | -metry | پاشگرێكە بە مانای پێوان |
| قياس - معايرة | Measure = Measuring = Gauging = Scale | پێوانە ، پێوان، پیڤان |
| قياسي | Standard | پێوانەیی |
| قياس الذبذبة | Oscillometry | پێوانەی لەرە |
| قياس جوكي | Jockey | جۆكی - ئەسپ سوار بە تایبەتی لە پێشبڕكێدا |
| قياس الاشعة | Actinometry | پێوانەی تیشك |
| قياس الحموضة | Acidimetry | پێوانەی ترس - پێوانەی ترشێتی |
| قياس دائري | Circular, Measure | پێوانەی بازنەیی: ڕژێمێكە بۆپێوانی كەوانەی بازنە و گۆشە بە پلە و خولەك و چركە |
| قياس الرطوبة | Hygrometry | پێوانەی شێ لە هەوادا |
| قياس مجال البصر | Optometry = Perimetry | بینایی پێوان - پێوانی بینایی<br>پێوانی مەودای بینینی |
| قياس طبيعي | | پێوانەی ئاسایی |
| قياس السكر | Saccharimetry | پێوانەی شەكر |
| قياس المبصر | Perimetry | پشكنین و پێوانی مەودای بینینی |
| قياس مئوي | Centigrade | پێوانەی سەدی |
| قياس فهرنهايتي | Fahrenheit scale | پێوانەی فەهرنهایتی |

| | | |
|---|---|---|
| قياس القلوية | Alkalimetry | پێوانەی تفتی |
| قياس السعرات الحرارية | Calorimetry | پێوانەی گەرموکە( سعره) |
| قياس الحل | Acetimetry | پێوانەی سرکە |
| قياس الكحول | Alcoholometry | پێوانەی ئەلکهول |
| قياس السمع | Acoumetry | پێوانەی بیستن |
| قياس حركي | Dynamic scale | پێوانەی دینامیکی |
| قياس الارتفاع | Levelling | پێوانەی بەرزی |
| قياس المقارن، قياسة | Large Sailing boat | کەشتییەکی چارۆکەداری گەورەیە |
| قياضة، مقايضة | Truck | گۆڕینەوە لە کەل و قەل بازرگانیدا وەکو گۆڕینەوەی دەغلو دان بە شەکر و چای |
| قيام - نهوض | Rising | هەڵسان= هەستان |
| قيالة = ظهيرة | Midday = noon | نیوەڕۆ |
| قياس الالوان | Colorimetry | پێوانی ڕەنگەکان |
| قيثار ، قيثارة، جيتار | Guitar = Lyra = Cittern =Cithara | گیتار ، تەموورە چەنك، جۆرێکە لە کەمانچە ئامرازێکی مەسیقایە لە کەمانچە دەچێت |
| قيثار، شلياق | Lyra, Lyre = The Harp | لایرا، گیتار، تار، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە |
| قيثار البحر | Guitar-fish | ماسییە گیتارە |
| قيح- صديد | Pus, Matter | کێم، ئازربی، زووخاو، خوزاو، زوخ |
| قيحي = صديدي | Puric = Purulent | کێمی = هەر شتێك پەیوەندی بە کێمەوە هەبێت |
| قيحي | Pyo-<br>Py- | پێشگرێکە بە مانای کێم |
| قيد - وثاق | Bridle = fetters = Shackles | پێوەند ، پاش بەند، کەلەپچە، تەووق، کۆت |
| قيد - رباط | Bond | بەند |
| قيد اللسان | Tongue tie | زمان بەستران |
| قيد لليدين - صفاد | Hand Cuffs = Gyves | کەلەپچە |
| قيد - رابطة | Vinculum | بەند= بەستۆك |
| قير- اسفلت | Asphalt = Pitch = Bitumen | قیر، زفت |
| قير | | تیلمەی لووت، پارچە گۆشتێکە بە سەرووی دەنووکی هەندێك باڵندەوە. |
| قيراط ، دانق | Carat, Quirat | کارات= قیرات، نیودانگ، حەبیە، نیوەی دەیەکی دینار = ٠,٢گرام ، پێوانی کێشی بەردی بەنرخ وەکو ئەلماس بەکاردێت، وە بە مەبەستی لە کارات ٢٤/١ بەش شتێك لە کانزا بەنرخەکانی وەکو ئاڵتوندا مەبەس لە کارات بڕی ئاڵتونی تیزاب ( خالیسە) بۆ نمونە نەسەنگی ئاڵتونی تیزاب =٢٤بەش - ٠,٢٠٥٩ گرام یان ٠,١٩٢٢گرام |
| قيريوس | | جۆرە ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی سوبێر ( هەنجیری دڕکاوی لقەکانی لوولەییە ، قیتە وەك مۆم وەستاوە |
| قيروطي | | جۆرە مەلحەمێکە |
| قيروان - قافلة | Caravan | کاروان |

| | | |
|---|---|---|
| قيسون، عشبة مقدسة | Lovender = Cotton = Ground-cypress | ڕێحانە کێویلە، جۆرێکە لە ڕووەکی ئەچیلیا دەشتەکی‌یە ، گوڵەکەی پەمەیی لان زەردە، گەڵاکەی وورد و تووکنە ، گەڵاو گوڵەکەوی بۆن خۆشن |
| قيصانة، قيصان | Moon fish= opah | ماسی‌یە هەیف ، ماسی‌یە زیوی ، ماسی‌یەکی کورتی قوپاوە ، ڕەنگەکەی زیوی‌یە لە دەریادا دەژی |
| قيصر - عاهل - امبراطور | Empiror, Czar | پاشا- ئیمبراتۆر = قەیسەر |
| قيصر الروم | Caesar | ناسناوی پاشاکانی ڕۆم بووە |
| قيصر الروس | Kaiser-cesar = Tzar = Czar | پاشاڵی ڕووس و ئەڵمان |
| قيصرية ، قيسارية | Caesarean = Roofed market place | قەیسەری ، کۆمەڵە دوکانێك هەموویان یەك دەرگا و یەك سەربانیان هەبێت |
| قيصوم جبلي، بعيثران، اخيليا منعشة | Achillea | لۆکەی لاوەنتە ، ڕووەکیَ:ی بۆن خۆشە گوڵەکەی زەردە |
| قيصوم - شيح = افسنتي - شيبه العجوز | Artemisia = Worm Wood = Absinth | بۆن خۆشکە- جۆرە ڕووەکێکە |
| قيضوم ، ريحـان الارض، مسك الجن | Abrotanum = Southern-wood = Old man | بۆمارانە- مارانبۆ: دەوەنێکی پزیشکی بۆن خۆشە ، گوڵەکەی بەش ێوەی هێشویەکی ئاڵتونی‌یە ،بۆنی خۆشە بەرەکەی لە بەری مۆرد دەچێت تاڵ و بۆن خۆشە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت |
| قيصوم انثى - استولية | Cotton-lavender | سانتۆلیا |
| قيصوم كافوري ، مسيكه | Worm Wood | گیایەکی پزیشکی‌یە گوڵەکیە ئاڵتون و بۆن خۆشە |
| قيصان | Moon fish | هەیڤو ماسی- ماسی‌یەکی دەریای بچووکی پانی شێوە زیوی‌یە |
| قيض - قشرة المبيضة | Egg shell | توێکڵە ڕەقە سپی‌یەکەی دەرەوەی هێلکە |
| قيصرية ، عملية القيصرية | Caesarean = operation = Cacsarean section | نەشتەرگەری قەیسەری ، هەڵدڕینی سك و دەرهێنانی کۆرپەلە کە لە منداڵدان ئەگەر منداڵ بوونەکە زەحمەت بێت |
| قيطان | Cord = Braid = Lace = Thick ribbon | قەتیان |
| قيطون، خزانة | Cup board | دۆلاب |
| قيطس ، سيتاسيا | Cetus = Sperm Whale | نەهەنگی عەنبەر ، جۆرە نەهەنگێکە ددانی هەیە بە شێوەی کۆمەڵ دەژی لە دەریا گەرمەکانمدا مادەی عەنبەری لێدەردەهێنرێت |
| قيطس - حوت العنبر | Cetus = The Whale = Kaitos | نەهەنگ ، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشووری یە ناوی ئەستێرەیەکە بە عەرەبی |
| قيظ ، شدة الحر | Scorching heat of summer | قرچە، قرچەی گەرما |
| قيعم، سنور | Cat | پشیلە |
| قيفاوي، خـافق - قيفاوس = ملتهب | Cepheus = Cepheid | سیفۆش، ئەستێرەیەکی پرتەکەرە پرشنگەکەی ناوبەناو دەگۆڕێت |
| قيق، زرياب، ابو زريق | Jay | بۆرەك ، قەلەباچکە ، جۆرە باڵندەیەکە لە قەلەڕەشکە دەچێت ، باڵەکەی هێڵدارە کلکی ڕەشە ، زۆر دەنگە گەنگ دەکات ، ڕەنگەکەی ژەنگارە، سەری ڕەشە هێڵی ڕەش و شی و سپی لەسەر سەر و باڵ و کلکی هەیە |
| قيقب، اسفندان | Maple = Acer Saddletree | کەیووت، نارەوەن، دارتۆخانە، کارەکار، کێکاو، تانکۆس ، دراەوەش، داریات، جۆرە درەختێکە گەڵاکەی لە لەپی دەست دەچێت گەلێك جۆری هەیە لقەکەی دارجگەرەی لێدروست دەکرێت بۆ ڕازاندنەوەی باخچەکان دەڕوێنرێت ، جۆرێکی هەیە بەرەکەی لە دووباڵ پێك هاتووە ، هەندێکی گەڵاکەی سپی‌یە گوڵەکەی زەردە ، هەندیَ:ی گوڵەکەی سوورە |

| | | |
|---|---|---|
| قيقب حقلي ، شجرة العرب ، لسان العصفور | Birds Tongue = Dogoak = Master tree | زمانه چۆلەکە، جۆرێکە لە ڕووەك |
| قيقب زهري ، قيقب مزهر | Flowering-maple | دەوەنێکی هەمیشە سەوزە گوڵەکەی سوورە لە گڵۆپ یان چرا دەچێت |
| قيقة | Conchiferous | ئەو تەنکەی ناوەوەی هێلکە کە سپێنەی داپۆشیوە |
| قيقب- جميزي | Sycamore = Sycamore fig | سایکافۆر، جۆرێکە لە ڕووەك. |
| قيلة مهبلية | Vaginocele | ئاوبەندی گوڵینك |
| قيلة مبيضية | Ovariocele | ئاوبەندی هێلکەدان |
| قيلة نخاعية | Myelocele | ئاوبەندی مەغزیی |
| قيلة لمفية | Lymphocele | ئاوبەندی لیمفی |
| قيلة دموية | Hematocele | ئاوبەندی خوێ، |
| قيلة دمعية | Lacryocele | ئاوبەندی فرمێسك |
| قيلة مثانية | Cystocele | ئاوبەندی میزەڵدان |
| قيلة مغبنية | Bubonocele, vesicocele | ئاوبەنگی پەناڕان |
| قيلة لعابية | Ptyalocele | ئاوبەندی لیك |
| قيلة ، ادرة | Hydrocele = Dropsy of the Testicle or scrotum | ئاوبەندی گون- کیس گون، کۆبوونەوەی ئاوێکی مەیلە و زەردە لەو بۆرییەدا کە تۆو ( سپێرم) لە گونەوە دەگوێزێتەوە |
| قيلة | -cele | پاشگرێکە بە مانای ئاوبەند - کیس |
| قيلة دموية | Haematocele | تورەکەی خوێ - کیسری خوێن، ئاوسانێکە بە هۆی دەلاندنی خوێنەوە بۆ هەندێك بەشەکانی لەش |
| قيلة دماغية | Encephlocele | قۆڕیی مێشك- هاتنە دەرەوەی مێشك لە ئێسکی شکاوی کاسەی سەرەوە |
| قيلولة - نوم الظهر | Midday nap | نوستنی نیوەڕوان |
| قيم - وصي - وكيل | Curator = Custodian | |
| قيمة حرارية | Caloric-Value | بەهای گەرمی- ئەو گەرمییەی کە لە ئەنجامی سووتانێکی کێشی سووتەمەنییەوە پەیدادەبێت |
| قيمة موجبة | Positive-Value | بەهای موجەب |
| قيمة الاستيل | Acetyl Value | بەهای ئەستیل ، ژمارەی میلیگرام لە هایدرۆکسیدی پۆتاسیۆم کە پێویستە بۆ هاوکێش کردنی ئەو ترشی سرکیکەی کە لە هاوکێش کردنی (تعادل) یەك گران لە چەوریی پەیدا دەبێت |
| قيمة حرارية - قيمة سعرية | Calorific-value | بەهای گەرمی |
| قيمة | Value | نرخ ، بایەخ، بەها، بایی |
| قيمة قيمة عددية - قيمة يودية - القيمة اليودية | Iodine-Value | بایەخی ژمارەیی، بەهای ژمارەیی ، بەهای یۆدی- بەهای یۆدی مادەیەکی ڕۆنی ( پیوی) بریتییە لە بڕی ئەو یۆدەی کە لە لایەن یەك گەرد لەو ڕۆنەوە هەڵ دەمژرێت |
| قيمر | | قەیماغ، سەرتوێژ، سەرشیر، توێژاڵ |
| قين- حداد | Black smith | ئاسنگەر |
| قينبرة ، جينبرة | Hoary Cress | گیایەکی زیان بەخشە بە کشتوکاڵ |
| قينس | Tragelaphus | جۆرە ئاسکێك ی گەروەیە هێڵی زەرد و سپی تیادایە |

| | | |
|---|---|---|
| قیوء ( یوثون) | | جۆرە ڕووەکێکە گەڵاکانی ڕەوان کەر و ڕشێنەرەوەیە |
| قیون، دیك البحر | Halcyon = Kingfisher | باڵندەیەکی لەشکەی مام ناوەندیە هەمەڕەنگە لەناو دارستان و جۆگەی ئاودا دەژی |
| قیوط ، ذئب البراري | The praire wolf Coyote | ( کۆیۆن) گورگی دشـتەکی گیانەوەرێکی بچووکە لـە گـورگ دەچێـت لـە باکووری ئەمەریکادا دەژی |
| قیوطیل = کیوتیل | Coyotillo | کۆیۆتیللۆ - گیایەکی ژەهرینە |

| | | |
|---|---|---|
| ك | K | (ك) کورتەی پلەی گەرمی پێوانەی کلڤن |
| كائن | Existent | بوە ، بوونەوەر |
| كائنات اولية | Protista | زیندەوەرە سەرەتاییەکان، ئەو زیندەوەرانەی کە لەشیان تەنها لە یەك خانە پێکهاتووە وەکوو ئەمیبا. |
| | Biota | زیندەوەرەکان، وکوو گیانەوەرو رووەك |
| كائن حي = كائنات حية | Orgazim = living | زیندەوەر: وەکوو گیاندارو رووەك. |
| كائن حي دقيق | Microorganism | زیندەوەری وورد وەکوو بەکتریا کە لە ژێر میکرۆسکۆپدا نەبێت نابینرێت. |
| كاؤلين = كاولين | Kaolin | قوری چینی، کائولین ، گڵە سپی |
| طين ابيض | Chinaclay | پاکترین گڵە لە سرووشتدا بۆ درووستکردنی فەخفوری بەکار دێت. |
| كاؤلينيت | Kaolinite | (کائۆلینات) ، مادەیەکی بنەرەتییە لە مەعدەنی کائۆلیندا |
| كاب | Wrapper = outer-leaf | پارچەیەك لە گەڵای توتنی ووشك، کە بشێت بۆ پێچانەوەی جگەرە. |
| كابح التيار | Resistor | ریزیستەر - بەرهەڵستیکار. |
| كابروليت | Caprolite | (کابرۆلایت)، جۆرێکە لە فۆسفاتی کالیسیۆم بەشێوەی کەرسەیەکی خاوە. |
| كابرو = غابرو | Gabbro | (گابرۆ) کەڤرێکە لە قوڵایی زەویدا پەیدا بووە، کە لە بنەرەتدا لە پلاجیۆ کلێزی کلس و پیرۆکسین و ئۆلیڤین پێك هاتووە. |
| كابركايللي - ديـك الخلنـج - صهيوج كبير | Capercailie = caper cailie | (کاپەر کایلی) - تەیهووی گەورە ، باڵندەیەکە جۆرێکە لە قەتی، بنەرەتەکەی باکووری بەریتانیایە، لە ساڵی (١٧٦٠) وە فری تێکەوتووە، بەڵام هێشتا لە وولاتی سویدا هەیە. لە باڵندە گەورەکانی کۆمەڵەی مریشکەو لە دارستانەکانی سنەوبەرو سەرووی ئەورووپاو باکووری ئاسیادا دەژی. |
| كابريومايسين | Capreomycin | (کاپریۆمایسین) جۆرێکە لە مادەی دژە ژیان لە لایەن ستریپتۆمایسینەوە دەردەهێنرێت، لە دەرمانسازیدا بەکار دێت. |
| كابتان | Captan | (کاپتـان) - ئاوێتەیەکـە لـە کـاربۆن و هـایدرۆجین و کلـۆرو نایـترۆجین و ئۆکسجین و گۆگرد پێکهاتووە، بە شێوەی تۆزێکی سپی هەیە، بۆ سازاندنی تۆوی رووەك و کوشتنی کەڕوو بەکاردێت. لە پیشەسازی پلاستیك و بۆیەو پێستەو لە پاراستنی میوەدا بەکاردێت. |
| كابسة | Pressor | پەستێنەر ، پەستۆك |
| كابة - الخناق - انقباض | Depression = low sprirts | ماتی - ماتەمینی - پەستی- دڵتەنگی - دڵقەبزی - خەمۆکی |
| كابلي - انقرديا - بـلاذر - مغنـة - جوزه كاشو | Acajou = anacadrdium = Cashewnut = Mahogany | (ئەکاجۆ) - ئەناکاردیەم -درەختێکە بەرەکەی لە دڵ ئـەچێ رۆنەکـەی بـۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی گولی باشە. |
| كابوشين - قردمقلنس - هجرس | Capuchin | (کاپوشین) - مەیمونی کڵاودار. (کاپوچین) مەیمونێکی رەنگ قاوەییە لە ناوەراستی ئەمریکاو کۆلۆمبیاو بەرازیل دا دەژی قژی سەری وەکو کڵاو وایە کلکەکەی درێژە. |
| كابوس جثام - ام الصبيان | Night mare = Succubg = succubis | ئاڵەشەوە - مۆتەکە - دێوەزمە - خێو - مێردەزمە |
| كابوك ، قابوق دعس | Cotton grass = Cotton sedge = Silk cotton tree | داری لۆکەی ئاوریشمی درەختێکی مەزنە بەرەکـەی بـە قـەدەر پرتـەقاڵێك دەبێت هێلکەیی یان خڕە ناوەکەی کۆڵکێکی تیایە لـە لۆکـە دەچێـت بـۆ هەندێ مەبەست بەکار دێت. |

| | | |
|---|---|---|
| کابول | Cant lever | کۆڵەکەیەکە لە یەك لاوە جێگیر کراوە. |
| کابیاء = خنزیر هندي = خنزیر غینیا | Guinea - Pig = cavia | (کاڤیا) بەرازی غینیا ، گیاندارێکی قرتێنەرە ، لە کەروێشك دەچێت شیردەر لەشەکەی گەورەیە ، سەری ئەستورە لمۆزی کولە گوێی بچوکە پەل کورتە، تیسکنە رەنگەکەی قاوەیی یا قاوەیی سووربباو یان زەردە لە باشوری ئەمریکا دەژی. |
| کابیبارا = خنزیر الماء | Capybara | (کاپیبارا) بەرازی ئاویی ، گیاندارێکی قرتێنەرە ، کلکی نییە، درێژییەکەی لە (٩٠) سم زیاترە، لە ئەمەریکای باشوردا دەژی، گەورەترین جۆری قرتێنەرەکانە، بە ئاسانی ماڵی دەکرێت. |
| کابیرو | Kaberu | (کابیرۆ) = گیاندارێکی شیردەرە لە کۆمەڵەی سەگ |
| کابازیت = جابازیت | Chabazite | (کابازایت - چاپازایت) بریتییە لە سلیکاتی ئەلەمنیۆمی کالیسیوم، رەنگەکەی سپی، مەیلەو سورە، زەردە یا قاوەیییە لە چارەکردنی گیرو گرفتی ئاودا بەکار دێت. یاسای کیمیای = $CaAl_2Si_4O_{12}.6H_2O$ |
| کاتابریس | Catapres | (کاتاپریس) دەرمانێکە بۆ چارەسەرکردنی کرژی یان پەستان لە لەشدا بەکار دەهێنرێت بە شێوەی حەبە. |
| کاتاراکت = اضلام العدسة | Cataract | (کاتاراکت)، ئاوی سپی، تەمی زەرەبینی چاو، ئاو لەچاو هاتن، نەخۆشی ئاو هاتنە چاوەوە. |
| کاتارهیني | Cattarrhine | کاتارهینی ، مەیموونە لووت باریکەکان. |
| کاتایون = کاتیون | Cation | (کاتایۆن) ئایۆنێکە بارگەکەی موجەبە لەکاتی شیکردنەوەی کارەباییدا بەرەو جەمسەری کاتۆد دەڕوات. |
| کاتالین | Catalin | (کاتالین) جۆرێکە لە ئاوی شین (رەش) لە چاودا بەکار دەهێنرێت. |
| کاتب | Writer | نوسەر، رازگر |
| کاتب السر= سکرتیر= کاتم السر | Secretary | سکرتێر. |
| کاتب حسابات | Accountant | ژمێریار |
| کاتب عدل | Notarypublic | نووسەرێکی دادگاییە ئەو رێکەوتنانە دەنوسێت کە خاوەنەکانیان دەیانەوێ شێوەیەکی یاسایی یان بدەنێ. |
| کاتدرائیة | Cathedral | کڵێسەی گەورە. |
| کاتکول - کتشول = کاتیکول - فنیل ثنائي الهیدروکسیللي | Catechol | (کاتیکۆل) کریستالێکی دەرزیلەی بێ رەنگە لە درەختی کاشیوو دەردەهێنرێت، وەکوو ماددەی پاکژکەرەوەو لە بۆیەو لە وێنەگرتنی فۆتۆگرافیو مەرەکەبو لە دروستکردنی پەیینی سووکەڵەدا بەکار دێت. |
| کاتلوك مسیر | Messier Catalogue | کەتەلۆکی میسێر |
| کاتم = کتیم | Impermeable | نەهێڵ ، ناگوزەر، نەگوزەر - ئەوکەڤرەی کە ناهێڵێت ئاوی پێدا گوزەر بکات. |
| کاتم السر - سکرتیر | Secretary | سکرتێر - رازگر. |
| کاتم الصوت | Muffler | بێ دەنگ کەر ، کپکەر. |
| کاتلینیت | Catlinite = pipestone | (کاتلینایت)، مەعدەنێکی سلیکەیتی دەنکۆڵە ووردە. |
| کاتولیت | Catolyte | (کاتولایت)، بەشێکە لە ئەلکترۆلایت دەوری کاتۆدی داوە ، پێکهاتە کیمیاییەکەی یان پەیتییەکەی ، بەکاری کارلێکی کاتۆد دەگۆڕێت. |

| | | |
|---|---|---|
| کاتیکۆ- کاد | Catechu | (کـاتیکوو) مادەیـــەکی رەقـە بـەڵام زوو دەشــکێت (تورتــە) رەنگەکــەی قاوەییـیـەکی تۆخـە، لـە تەختـەی داری ( کاشیاکاتیکو) کـە جۆرێکـە لـە درەختی ئەکاکی (ئەکاسیا)، دەردەهێنرێت مادەیـەکی گیرکـەرە لـە دەبـاغ کردنی پێستەو چاپکردنی قوماشـی لۆکـەو لـە مـەیانی پزیشـکیدا بـەکار دەهێندێت. |
| کاتینغا = کاتینجا | Catinga | (کاتینگا) - دارستانی ناوچە ئیستیوائییەکانی وڵاتی بەرازیل. |
| کاثب = جاروك | Withers - of horse | ناوشانی وڵاخ. |
| کاثود - مهبط | Cathode | (کاثۆد) ، ئەو بەشە جەمسەرەیە کە ئەلکترۆنی لێ دێتە دەرەوە لە بۆری ئەلکترۆنیدا، ئـەو جەمسـەری (پۆلـی) کارەبایی‌یـە کـە تیـایدا، توخـم یـان ئایون، ئەلیکترۆن وەردەگرێت. |
| کاجو | Kagu | (کـاجو) باڵندەیەکـە لـە کۆمەڵـەی قوڵنـگ بەقـەدەر شینەشـاهۆیەك دەبێـت، باڵەکانی لاوازن توانای فڕینی نی‌یە، لە دوورگەی کالیدۆنیای نوێدا دەژی. |
| کاح - کیح = سفح الجبل | Side of mountain | دامێنی چیا. |
| کـاحل = کعـب القـدم = کعب الرجل | Ankle = Ankle bone | پاژنەی پـێ ، قوڵـە پـێ ، قوڵـە قـاپ ، مەچـەکی قـاچ ، رەقەڵـە ، پـەحنی ، گوریزنگ ، رەقەڵەی بەینی پێ‌و لولاقی قاچ. |
| کاد | Cade | (کاد) جۆرێکە لە درەختی هەڤریسك. |
| کاد هنـدي = سنط کاشو | Catechu-tree = acacia catechu = Khair tree | کاجو، کاتشو، مادەیەکە لە درەختی ئەکاسیا (ئەکاکی) دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی‌و رەنگ کردن‌و دەباخی بەکار دێت. |
| کادالوم | Cadalume | (کادالووم) نیشانەیەکە بۆ رێگەی (پرۆسەی) رووکەش کردنی کارەبایی بە کادمیۆم بۆ پاراستنی ئاسن‌و پۆڵا. |
| کادافیرین | Cadaverine | (کادافیرین)، شلەیەکی بـێ رەنگـە لـە دروسـتکردنی پۆلیمـەرو لێکۆڵینـەوە بایۆلۆجی‌یەکاندا بەکاردێت. |
| کادح | Labour, toiler | رەنجدەر ، ئیشکەر، زەحمەت کێش. |
| کادمة - ماکنة قص- الثیل | Lawn- mower | مەکینەی چیمەن ، مەکینەی چیمەنبڕ. |
| کادمیوم | Cadmium | کـادمیۆم = توخمێکـی کانزاییـە هێماکـەی (cd) ژمـارەی ئەتۆمی‌یەکـەی (٤٨) و کێشی ئەتۆمی ١١٢/٤ هاوهێزی‌یەکەی (٢) هەشت هاوتای جێگیری هەیە، بە شێوەی کانزایەکی شینی مەیلەو سپی یان تۆزێکی سپی مەیلەو خۆڵـەمێشی هەیـە، بـۆ رووکـەش کردنـی کانزاکـان‌و لـە درووسـتکردنی دارشـتەو ئـامرازی ئەلـەکترۆنی و پاراستنی دەزگاکـان لـە ئـاگرو پـاتری کادمیۆم‌و تەلی ناردنی هێزی کارەبای تەلەفزیۆن‌و بۆیـەی سیرامیك‌و میناو داین کردنی لەت بوونی ئەتۆم لە کارپێکەرە ناوکی‌یەکاندا ، هـەروەها لە دەرمانی کەڕوو کوشتن و لە وێنەگرتنی فۆتۆگرافیدا بەکار دێت، ناوەکەی (کادمیا)، زەوی دەگرێتەوە ، هەڵمەکەی ژەهرین‌و رەنگ پرتەقاڵی‌یە. |
| کادمیا | Cadmia | (کادمیا) یەکێکە لە ئۆکسیدەکانی زینك. |
| کــــادولینیت = غــــادولینیت = جادولینیت | Gadolinite | (گادۆلینـایت)- مەعدەنێکـە لـە بـیریلیۆم‌و ئاسـن‌و یتـەریۆم و سـلیکۆن‌و ئۆکسجین ، رەنگەکەی رەشی مەیلەو سەوز ، قاوەیی‌یە. |
| کادي | Caddy | (کادی) شلەیەکی کادیۆمی‌یە بۆ لەناوبردنی کەڕوو بەکار دێت، بە تایبەتی لە گژو گیادا. |
| کادینین | Cadinene | (کادینین) هایدرۆکاربۆنێکی رێسینی‌یە لە رۆنی کاد دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| كاذب - زائف | Pseudo = false =pseud | پێشگرێکە بە مانای درۆزنە ، گەند ، ساختە. |
| كاذب الخنوثة | Pseudo- hermaphrodite | نێرەموکی درۆزنە - گەندە نێرەموکی |
| كاذة | Inguinal region | بەرموسڵدان ، لاران ، کە دەوری ، ئەندامی رەگەزی داوە، پەناران. |
| كاذي | Pandang oil plant = Screw pine = pandanus | درەختێکە لە دارخورما دەچێت ، بۆ مەبەستی رازاندنەوە بەکار دێت، گوڵەکەی بۆنی رۆنی پێ خۆش دەکرێت، بەرەکەی قوچەکەیە دەخورێت. |
| كاراتيه | Karate | (کاراتێ) ڕێگەیەکی یابانییە بۆ خۆپاراستن بەبێ بەکارهێنانی چەك. |
| كاراثين | Karathane | (کاراثـین) ، دەرمانێکە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی رووەکی. |
| كاراكارا - قراقارا = كركار | Caracara | (کاراکارا) ، هەڵۆیەکە لە باشووری ئەمەریکادا دەژی. |
| كاراكـــال - عنـــاق الأرض - عنجل - فنجل - فرنق | Caracal = felis caracal | (کاراکال) ، گوێ رەشە - پشیلەی دارستان گیاندارێکی درەندەی گۆشتخۆرە لە کۆمەڵەی پشیلەیە رەنگەکەی سووری مەیلەو قاوەییە، گوێچکەکانی تۆپەڵە مووی رەشیان پێوەیە ماڵی دەکرێت و راوی پێ دەکرێت. |
| كاراكول - نعجة كاراكول | Caracul = karakul | (کاراکوول) جۆرێکە لە مەر. |
| كارامايسين = غارامايسين | Garamycin | (گارامایسین) جۆرێکە لە مەڵحەم و قەترەی چاو. |
| كارامل - كاراميل - كرملة | Caramel | (کارامێل) - کرێم کارامیل - جۆرێکە لە حەڵوا لە شیرو هێلکەو شەکری سووتاو دروست دەکرێت، هەروەها لە گەرم کردنی شەکر پەیدا دەبێ ، بەکار دەهێنرێ بۆ رەنگ کردنی (ویسکی) کارامل شەکری سووتاو ، لە شلەی ئاووگی گەنمەشامی دروست دەکرێت بە گەرم کردن. |
| كارمين = كرمين | Carmine = Carmin | (کارمین) رەنگێکی سورە لە پوختەکردنی رەنگی قرمز بە ئاوی کوڵاوو نیشاندنی بە ئەلۆمینا دەستگیر دەبێت لە ٥٠٪ ترشی کامینیکی تیادایە بۆ رەنگ کردن بەکار دێت. |
| كارب - شبوط | Carp | (کارپ) - جۆرێکە لە ماسی. |
| كارباكول | Carbachol | (کارباکۆل)، ئاوێتەیەکە بە شێوەی بلووری زەرد یان سپی هەیە، یان بە شێوەی تۆزێکی بلوری هەیە، لە ئاوو ئەلکهولدا دەتوێتەوە، لە دەرمان سازیدا بەکار دێت. |
| كاربازول | Carbazole $(C_6H_4)_2NH$ | (کاربازۆل)، ئاوێتەیەکی کیمیاییە لە خەڵوز درووست دەکرێت بە شێوەی بلووری سپی هەیە، بۆنێکی تایبەتی هەیە، لە دروست کردنی بۆیەو تەقەمەنی و دەرمانی مێروو کوژو رۆنی مەکینەو مادەی دژی ئۆکسینەر لە لاستیکدا بەکاردێت. |
| كارباريل | Carbaryl | (کارباریل) - ئاوێتەیەکی رەقە بە شێوەی دەرمانی مێروو کوژ بەکار دەهێنرێت. |
| كارابس الذهبية | Golden beetle | کارابسی زێڕی ، جۆرێکە لە قالۆنچە. |
| كاربون- كربون | Carbon | (کاربۆن) ، خەڵوز، رەژی، رەژو،مادەیەکی ساکارە، (ناکانزا) رەقەو رەشە، ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٦)، کێشی ئەتۆمییەکەی (١٢) لە پێکهاتنی شانەی زیندەوەردا بەشدارە، بەشێوەی سوتەمەنی بەکاردێت هەروەها گەلێك سودی تری هەیە نیشانەکەی (٢) هاوهێزییەکەی (٤). |
| كاربوني(ج) | Carboni -ferous | کاربۆنی (ج) سەردەمێکی جیۆلۆجییە تیایدا کۆنترین و گرنگترین نیشتەنی خەڵوز پەیدا بووە. |
| كاربون (١٤) | Carbon 14 | کاربۆن (١٤)، هاوتایەکی تیشکدەرەوەی کاربۆنە، کێشی گەردیلەییەکەی (١٤)یە لە جیاتی (١٢) نیوە تەمەنی شی بوونەوەکەی (٥٥٦٨) ساڵە، بۆ مەبەستی دۆزینەوەی تەمەنی کەڤرو بووبەردەکان بەکار دێت. |

| | | |
|---|---|---|
| كاربون فلوري | Fluoro Carbon | (كاربۆنی فلۆری) - ئاوێتەیەکی ئەندامییە ، فلۆری تێ کراوە لە دروستکردنی گریس و بۆیەدا بەکار دێت. |
| كاربون فعال | Active Carbon | كاربۆنی چالاك |
| كاربوني فحمي | Carbonaceous | (كاربۆنی) = خەڵوزیی ، هەرشتێك پەیوەندی بە كاربۆن یان خەڵوزەوە هەبێت. |
| كاربون مشع | Radio active carbon | كاربۆنی تیشکدەرەوە، ئەو كاربۆنەی کە رەوشتی چالاکی تیشدانەوەی هەیە. |
| كاربة - مسلفة قرصية | Disc harrow | شانەی خەپلەیی - ئامرازێکە بۆ رێکخستنی زەوی کێڵراو. |
| كاربوراتير | Carboretor | (کابرێتەر) = ئامرازێکی میکانیکییە لە جوڵێنەری سوتانی ناوەکی ئۆتۆمبێلدا بەکار دێت. |
| كاربوهيدرات - كربوهيدرات | Carbohydrate | (كاربۆهیدرات) ، کۆمەڵە ئاوێتەیەکی ئەندامی (ئۆرگانیکییە) ، لە كاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین پێکهاتووە، وەکو شەکر و نیشاستەو سلیلۆز. رێژەی هایدرۆجینەکەی بۆ ئۆکسجینەکەی ئەکاتە ١/٢. |
| كاربوراندم - كاربيد السليكون | Carbourundum | (كاربۆراندم) - كاربیدی سلیکۆن. |
| كاربوكبس - دودة الثمار | Carpocapsa | کرمی میوەجات جۆرە مێرویەکە زیان بە درەختی بەردار دەگەیەنێت. |
| كاربوكسيلاز | Carboxy lase | (كاربۆکسیلێز) .. |
| كاربوكسي هيموغلوبين | Carboxy hemo-globin | (كاربۆکسی هیمۆگلۆبین) هیمۆگلۆبینی خوێن، ئەگەر گازی یەکەم ئۆکسیدی كاربۆنی مژی بێت، یەکی دەخات لە گواستنەوەی گازی ئۆکسجین دا. |
| كاربونات النحاس القاعدية | Basic copper carbonate | بێزیك کوپەر كاربۆناتی ، كاربۆنەیت مس تفت.. |
| كاربونيل - كربونيل | Carbonyl | (كاربۆنیل) ئاوێتەیەکە دژی رزین بۆ پاراستنی تەختە بەکار دێت. |
| كاربونادو = الماس اسود | Carbonado | (کاربۆنادۆ) - ئەڵماسی رەش. |
| كاربونات | carbonate | (كاربۆنات)، رەگی ترشی كاربۆنێك هاوهێزییەکەی (٢). |
| كاربونات الكالسيوم - مادة اللؤلؤ - طباشير | Calcium-carbonate | دەباشیر ، تەباشیر ، کالیسیۆم ، كاربۆنات ، بەردی قسل |
| كاربونات الصوديوم | | |
| كاربونات البوتاسيوم | | |
| كاربيد - كربيد | Carbide | (كاربید) رەگێکی کیمیاییە هاوهێزییەکەی (٢) وەکوو لە کالیسیۆم كاربیددا. |
| كاربينول | Carbinol | (كاربینۆل) ، ناوی زانستی ئەلکهولی مەثیلی. |
| كاربيتول | Carbitol | (كاربیتۆل) ناوێکی بازرگانییە بۆ کۆمەڵەی ئەو ئیثەرانەی کە تاك یان جووت ئەلکیلن. |
| كارت - بطاقة | Card | بیتاقە - بلیت. |
| كارتون - ورق مقوي | Cartoon | كارتۆن ،موقەبا. |
| كارتون مسامي | Porous cartoon | كارتۆنی کونیلەدار. |
| كارتوغرافيا | Cartography | (كارتۆگرافی)دروستکردنی نەخشەو پەیکەری جیۆگرافی |
| كارثة - نكبة | Catastrophe = Cataclysm | کارەسات ، بەسەرهات ، کۆست. نەگبەتی، رووداوێکی جیۆلۆجی بە تینە هەموو یان زۆربەی زیندەوەرانی ناوچەیەکی تیادا دەفەوتێت. |
| كارثامين | Carthamin ($C_{21}H_{22}O_{11}$) | (كارثامین) تۆزێکی سووری تۆخە.بریسکەیەکی سەوزی هەیە ، کەمێك لە ئاودا دەتوێتەوە، لە ئەلکهولدا دەتوێتەوە، بۆ رەنگ کردن بەکار دێت. |
| كارثة طبيعية | | کارەساتی سرووشتی |
| كارديوغراف - راسمة القلب | Cardio graph | (كاردیۆگراف) ، ئامرازێکە بۆ وێنەگرتنی (تۆمارکردنی) پرتەی دڵ. |

**کاردیتوکسین** Carditoxin (کاردیتۆکسین) ، دەرمانێکە بۆ چارەکردنی پەك کەوتنی دڵ ، بە شێوەی حەب هەیە.

**کاردینیا** (گاردینیا) دەوەنێکی جوانە ، بۆ رازاندنەوەو سێبەر بەکاردێت. هەمیشە سەوزە ، نزیکەی (٢م) بەرز دەبێتەوە گەڵاکانی هەمیشە سەوزو ئەستورن ، گوڵەکانی سپی یان زەردی بۆن خۆشن.

**کارست** Karst (کارست) کەڤرێکی کلسی‌یە، بەکاری ئاوی رەوان تووشی داڕزین بووەو وای لێهاتووە، کە لە بەرو ئەشکەوتی ئەوتۆی تێدا پەیدا بێت کە رووباری ژێر زەوی پیادا تێپەڕبێت.

**کارفون** Carvone (کارڤۆن) شلەیەکە رەنگەکەی زەردی کاڵ یا بێ رەنگە، بۆنێکی تیژی هەیە لە ئەلکهول‌و ئیثە رو کلۆرۆفۆرم دا دەتوێتەوە ، بەڵام لە ئاودا ناتوێتەوە. بۆ بۆن‌و تام خۆش کردن بەکار دێت.

**کارفاکرول** Carvacrol (کارڤاکرۆل) ، جۆرێکە لە مادەی ڤینۆل ، بە شێوەی عەترو کەڕوو کوژو تام خۆشکەر بەکار دێت.

**کارِفة - حشيشة الجميل** Globetulip = رووەکێکی پیازی‌یە لە کۆمەڵەی زەمەق گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویەکی سور یان زەردی لەیلاقییە.

**كارمي** Carme (کارمی) پاشکۆی هەسارەی بەرجیسە (مشتری) لە ئەستێرەکەوە (١٤٠٥٠+١٠$^{٢}$) میل دورە، تیرەکەی (١٥) میلە.

**کارمین = کرمین** Carmine = Carmin (کارمین) رەنگێکی قرمزیی ئەلەمنیۆمی‌یە لە مێرووی قرمز دەردەهێنرێت. بریتی‌یە لە پارچەی قرمزی بریسکەدار بە ئاسانی وورد دەکرێت، لە گیراوەی قلیەیی یەکان و بۆ راکسدا دەتوێتەوە هەروەها کەمێك لە ئاوی گەرمدا.لە دروستکردنی بۆیەو مەرەکەب‌و تاقیگەی کیمیایی‌و مادەی رەنگکردنی خۆراك‌و لە مەیانی پزیشکیدا بەکاردێت.

**کارنالایت** Carnalite ($K_cl$- $Mgcl_2$. $H_{20}$) (کارنالایت) یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی مەگنیسیۆم‌و کلۆر. کلۆریدی ئاویی سروشتی دووانەی توخمی پۆتاسیۆم‌و مەگنیسیۆمە، رەنگەکەی سپی‌یە مەیلەو قاوەیی مەیلەو سوور، رووشگەکەی سپی‌یە، بریسکەکەی رۆنی‌یە، دیاردەی فۆسفۆریسێنتی خێرا تیا پەیدا دەبێت، تامەکەی تاڵە ، ئاو مژە کێشی جۆری (٦٢و١) پتەوی = ١ ، لە ئەڵمانیای خۆرئاوا ، ئەلساسی (Alsace) و نیومەکسیکۆدا هەیە سەرچاوەیەکی بازرگانی‌یە بۆ دروستکردنی خوێیەکانی پۆتاسیۆم.

**کارنوبا - نخل الشمع** Ceroxylon = waxpalm (کارنوبا) درەختێکە لە دارخورما دەچێت مادەی مۆم لە گەڵاکەی یا ڕەگەکەی دەردەهێنرێت.

**کارنوتیت** Carnotite $K_2(uo)_2(vo4)2.\ 3H_2O$ (کارنۆتایت) ، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی یۆرانیۆم، ٤٠٪ یۆرانیۆمی تێدایە، ڤانادایتێکی ئاوی سروشتی هەردوو توخمی یۆرانیۆم و پۆتاسیۆمە، بە ئاسایی لە بەردە لمی‌یەکان‌و کەڤرە نیشتەنی‌یەکاندا دەبینرێت، رەنگەکەی لیمۆیی‌یە، بریسکەکەی خاکی ین مرواری‌یانە یان ئاوریشمی‌یە مەعدەنێکی تیشك دەرە، بە شێوەی تۆز یان دەنکۆڵەی وورد هەیە ، لە کۆلۆرادۆ ئەریزۆناوئوسترالیاو کۆنگۆ و روسیادا هەیە، مادەیەکی ژەهرینە، سەرچاوەیەکە بۆ توخمی رادیۆم.

**کارنالایت** Carnalite (کارنالایت) ، کلۆریدی پۆتاسیوم مەگنیسیومی ئاوی.

**کارنوسین** Carnosine ($C9H_{14}N_4O_3$) (کارنۆسین) ترشێکی ئەمینی‌یە لە ماسولکەی مرۆڤ‌و گەلێك گیانداری تردا هەیە، لە توێژینەوەی بایۆ کیمیایی‌دا بەکار دەهێنرێت.

| | | |
|---|---|---|
| كارنيت = جارنيت = عقيق احمر | (garnet) | (گارنيت) = ياقيقى سوور- مەعدەنێكە بریتی‌یە لە سليكاتی چەند كانزايەك بە شێوەی بەردی بە نرخ و مادەی كرێنەر بەكار دێت. |
| كارنيليان - ينع | Carnelian | (كارنيليان) جۆرێكی سوورە لە ياقيق چونكە ئۆكسيدی ئاسنی تيايە. |
| كاره الزواج | Misogamist | كەسێك ڕقی لە ژنهێنان بێت. |
| كاره النساء | Misogynist | كەسێك ڕقی لە ژن بێت. |
| كارة الشمس - رهبة الشمس | Heliophob | خۆر نەويست، ئەو ڕووەكەی كە حەز بە ڕووناكی ناكات. |
| كاروس | Kaross | كارۆس ، جل‌و بەرگێكی ساكارە، هۆزەكانی باشووری ئەفەريقيا بەكاری دەهێنن. |
| كاروب | Malecricket | ملـە ، جۆبركە ، جۆرە مێروويەكە ژێـر زەوی هەڵدەكەنێت‌و ڕەگـی ڕووەك دەخوات. |
| كارو= قرو | Karrroo = karoo | (كاروو) : )١ زەوی‌يەكی بەرزی ووشكانی‌يە لە باشوری ئەفريقادا. ٢) جۆرێكە لە كەڤر. |
| كاروك = مهد | Cradle | بێشكە ، لانك ، لاندك. |
| كاروتين | Carotene = Carotine = 4oH 56) | كارۆتين- پرۆڤايتەمين ئەی بريكاری (ڤيتامين ئەی) يە ، بە شێوەيەكی ئاسايی لە ڕووەكەكاندا هەيە، لە سێ ئايزۆمێر (isomer) لە ١٥٪ ئەلفا. ٥٨٪ بێتا ، ١٪ گاما ، ؟؟ كارۆتين يەكێكە لە پۆلێكی گەورە لە ڕەنگ (بۆيە) پی‌يان دەوترێت (كارۆتينۆيدەكان). هەمان پێك هاتی ڤيتامين ئەی هەيەو لە جگەردا دەبێت، هەمان ڤيتامين بە شێوەی بلوری سووری ياقوتی هەيە،لە هەوادا بە ئاسانی دەئۆكسێت، لە ئاودا ناتوێتەوە كەمێك لە ئەلكهول‌و ئيثە ردا دەتوێتەوە لە كلۆرۆفۆرم و بەنزين‌و ڕۆندا دەتوێتەوە ، ژەهر نی‌يە، ئەم جۆرە كە ڕەنگێكی زەردی مەيلەو پرتەقاڵی هەيە، لە ڕووەك‌و قەوزەو كەڕوو هەندێك گيانداری دەرياييدا هەيە، بە تايبەتی لە گەڵاو بەرهەمەكانی ڕەنگ هەروەها لە كەرەو گێزەردا ، لە مەيانی دەرمان سازی‌و ڕەنگ كردنی كەرەو ڕۆنی ڕووەكی‌و لە دروست كردنی خۆراكدا بەكاردێت. |
| كاري - بهار هندي | Curry | (كاری) بەهاراتێكی تێكەڵاوە لە زەردە چەوەو گژنيژو ئاڵەت‌و دەلو بيبەرو سيرو زەنجەفيل دەهاڕێت‌و دەكرێتە خواردەمەنی‌يەوە. |
| كاريبو= رنة كاريبو | Reindeer = caribou | (كاريبۆ - ڕێن) ، جۆرێكە لە گەوزن ، شێوەكەی لە نێوان ئاسك‌و وشتر دايە ، قورسی‌يەكەی زۆرجار لە دوو تەن تێپەڕ دەكات، لەناو دارستانەكانی باكووری ئەمريكاو وڵاتانی ئەسكەندەناڤيا دەژی ، لە هەندێ وڵاتدا گاليسكەی پێ ڕادەكێشن،شاخەكانی پەلكدارن. |
| كاريسا | | دەوەنێكی دڕكاوی هەميشە سەوزە بۆ ڕازانەوەی باخچەكان دەڕوێنرێ ، گوڵەكانی سپی‌و بۆن خۆشن، بەرەكەی سورەو دەخورێ‌و (صماص سان) ی لێ دەردەهێنرێ، كە دەكرێتە زەڵاتەوە. |
| كاريكاتور | Caricature | (كاريكاتۆر) - ڕێبازێكە لە وێنەكێشاندا، لە ڕادەبەدەر چاكی‌و خراپی سيفەتەكانی ئەو كەسە دەردەخات. |
| كازائين - جبنين - كازيين | Casein | (كازائين) ، پرۆتينی شير ، (٣٪) لە چەند پرۆتينێك پێك هاتووە لەگەڵ فۆسفۆرو كاليسيۆم دا ، لە شيردا بە شێوەی كازا ئيناتی كاليسيۆم هەيە، پرۆتينێكە لە ماست دەردەهێنرێت، لەگەڵ فۆرمالديهايد يەك دەگرێت بۆ دروست كردنی پلاستيك. |

| | | |
|---|---|---|
| كازورينـا - فلـوة - صنوبر استرالي | Iron wood tree = Beef wood tree = She Oak = Swamp Oak = Casuarina = Casurina = Australian oak | (كازۆرینا) بەڕوی ئوستورالی ، درەختێکی هەمیشە سەوزە، نزیکەی (٥٠) م بەرز دەبێتەوە، تەختەکەی زۆر سەختە ،ڕەنگێکی سوری تاریکی هەیە، لە ڕەنگی گۆشت دەچێت، بۆ مەبەستی پەرژین دەروێنرێت. |
| كاس | Cup = glass = lime = Beaker | پیاڵە، بەرداخ ، کاسـە ، کـەوڵ ، سـافر ، بیکـەر ، جـام ، بـادە، لـە کیمیـا گەریدا بۆ گواستنەوەی شلە بەکار دێت. |
| كاس الزهرة - كاسية (ورقة) | Calyx = Sepal = Calix | کاسەی گوڵ ، گەڵای کاسەی گوڵ ، ڕیزە گەڵا سەوزەکەی دەوری گوڵ. |
| كاس خشبي | | کاسەی تەختە ، کاسەی دارین. |
| كاس العين | Eye Cup | پیاڵەی چاو تیادا شتن بۆ پاکژکردن. |
| كاس | Alkes | ئەلکاس، ناوی ئەستێرەیەکە بە عەرەبی. |
| كاسي | Calycine | کاسەیی ، هەر شتێك لە کاسە بچێت وەکوو کاسەی گوڵ. |
| كأس المحبة | Loving cup | کاسەی دڵداری ، کاسەیەکی گەورەی ئەخشـێنراوە بـۆ خواردنـەوە بـەکار دێت. |
| كاس الحجامة - محجمة | artificial -leech | پەرداخی کەڵەشاخ ، پەرداخی باکێش |
| كاسية النور | Caly canthus | دەوەنێکـی بـۆن خۆشـە بـۆ ڕازاندنـەوەی باخچەکان دەروێـنرێت، کاسـەی گوڵەکەی ساکارە. |
| كاسيات | | جۆرە گیاندارێکی ساکارە وەکوو چرای دەریا. |
| كاس فخاري | | کاسە ، گلێنە ، قاچوخ. |
| كاس الموت | Death cup | قارچکە، مارانە، قارچکە ژەهرینە، تسقلە گولانە. |
| كاســافا - تابيوكــا - مانيوك - مانيهوت | Cassava = tapiocu = Manioc = manihot | کاسافا ، تاپیوکا ، مانیوك ، جۆرە ڕوەکێکە مادەی نیشاستەی زۆر تێدایە ، لە ڕەگە سـەلکدارەکانی بەدەسـت دەهێـنرێت ، وەکـوو خـۆراك ، یـان لـە دروسـتکردنی خـۆراك دا بـەکار دێـت، هـەروەها لـە هـەندێ کـرداری پیشەسازیدا ، وەکوو لە چاپی سەر بـەرد (Lithography) و مەرەکـەب و زەمقا بەکاردێت، لە ئەمەریکای باشوور بە تایبەتی لە بەڕازیل دەروێت. |
| كاستريجيل | Gastrigel | (کاسـتریجیل) ، دەرمانێکـە بـۆ چـارەکردنی ترشـەڵۆکی گـەدەو پـاکردنەو سوتانەوەی گەدە، بە شێوەی شلە هەیە. |
| كاستروبيل | Gastrobel | (گاسترۆبیل) دەرمانێکە بۆ چارەکردنی ترشەڵۆکی گەدە، بە شێوەی تۆزو حەبیش هەیە. |
| كاستوريوم | Castoreum | (کاستۆریۆم) ، مادەیەکی بۆن خۆشە لە لەشی سەگلاو دەردەهێنرێت. |
| كاسح | Invading | هـەر ڕووەکێکـی دەشـتەکی زاڵ بێـت بەسـەر ڕوەکـی کشتوکاڵـی تـرداو نەهێڵێت ئەشونما بکات. |
| كاسعة - لاحقة | Suffix | پاشگر ، لـە زمانـەوانیدا واتـە لـە نوسـیندا .. وەکـو (زانـی) لـە ووشـەی زەویزانیدا. |
| كاسحة الجليد - كاسحة الثلج | Snow sweeper | بەفرماڵ ، ئامرازی بەفرماڵین. |
| كاسحة الألغام - كانسة الألغام | Mine Sweeper | لەغەم ماڵ ، کە کەشتیەکە لە تەختە دروسـت کـراوە ، موگناتیسـی تیـا نییە، مقەستی پێویە بۆ بڕینی ئەو تەلانەی کە لەغەمەکان دەبەستن، بە یەکـەوە لـەژێر ئـاودا ، هـەروەها ئـامرازی تایبـەتی تیایـە، بـۆ تـەقاندنی لەغەمەکان. |

| | | |
|---|---|---|
| كاسد - كسيد | Stagnant | بێ برەویی، بازاڕی بێ برەو. |
| كاسر | Refringent = refractive | شكێنەر ( لە فیزیای ڕووناكی‌دا) |
| كاسر | Predator | تێكشێن - گیانداری دڕندەی وەكو گورگ. |
| كاسرة الأمواج = حائل الأمواج | Break water | شەپۆل شكێن - دیوارێك یان بەربەستێك بۆ پاراستنی بەندەرەكان لە كاری شەپۆلی دەریا. |
| كاسر العظام - بلع - بلت | Gypeaetus = Lamergeyer | ئێسك شكێن ، داڵی كەرخۆر ، سیسارکی ڕیشدار ، جۆرە داڵێكی گەورەو دڕندەیە ڕەنگەی بۆرە بەرخ و كەروێشك دەخوات. دەیانفڕێنێت و لە ئاسمانەوە بەریان دەداتە خوارەوەو دەیانخوات. |
| كاسر الجوز - خازن البندق | Nuthatch = Sitta | گوێزشكێن ، جۆرە باڵندەیەكی بچوكە لە چۆلەكە گەورەترە، دەنوكی ڕاست و تیژە گەورەیە گوێزی پێ دەخوات ، پشتەكەی شینی ژەنگارەو بەر سكی سپی‌یە. |
| كاسر الحجر = حالوم = شنجبار مخزني - حب القلب | Gromwell = pearlplant = Saxifrage | بەردشكێن - كەوڵە شوانە، ڕووەكێكی دەشتەكی‌یە گەڵاكەی تەسك و توكنە، گوڵەكەی پەمەیی‌یە تۆوەكەی لە مرواری دەچێت، بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| كاسرة الضوء | Refractive | ڕووناكی شكێن- ئەو ماددەیەی كە ڕووناكی تیادا دەشكێتەوە. |
| كاسور - خنزرة | Stone axe | پیك ، پاچێكە بۆ شكاندنی بەرد بەكاردێت. |
| كاسواري = شبنم | Casso wary | كاسواری - باڵندەیەكی ڕەنگینە لە ووشترمر دەچێت بەڵام بچووكترە. |
| كاسيا ناعمة | Senna | سینا .. سینەمەكی. |
| كاسيا فستولا - خيار شنبر | Cassia fistula = pudding pipe tree = purging Cassia | خەیار چەمبەر ، ئەم درەختە لە ناوچە گەرمەكاندا دەڕوێت، درەختێكی گەورەیە، گەڵاكانی دەوەرێ، نزیكەی (١٠) مەتر بەرز دەبێتەوە، گوڵەكانی جوان و ڕەنگ زەردن، بە شێوەی هێشوو بەرەكەی درێژكۆڵەو قاوەیی و ڕەق و درێژە لە ناوەوەو دەرەوە ، تۆوی ڕەقی تیایە، بەرەكەی بۆ مەبەستی پزیشكی بەكار دەهێنرێت. |
| كاسيتريت - حجر القصدير | Cassiterite | بەردە تەنەكە ( كاسیتراێت) بریتی‌یە لە ستانیك ئۆكساید (دووەم ئۆكسیدی تەنەكە) كەرەسەیەكی خاوە بۆ تەنەكە، ڕەنگەكەی زەردی مەیلەو قاوەیی یان ڕەشە. بریسكەكەی ئەڵماسی یا تەڵخە ڕووشگەكەی سپی‌یە پتەوی‌یەكەی ، (٦-٧) كێشی جۆری‌یەكەی (٨و٦ ١و٧) لە مەلایۆ و بۆلیڤیاو ئەندەنوسیاو ئەفریقادا لە كەمەرە ئاگرینەكاندا هەیە. |
| كاسية - خشب مر | Quassia = Bitterash | (كواسیا) تەختە تاڵە ، دەوەنێكە، گەڵاكەی ئاوێتە (٣) یان (٥) پەلكە گوڵەكەی سوورە، پێی دەوترێ تەختەی(سوورینام) (surinam) ماددەیەكی پزیشكی تاڵی لێ دەردەهێنرێت. |
| كاسينو | Cassino | (كاسینۆ) ، جۆرێكە لە كاغەزی یاری. |
| كاشط - حاك | Abrasive | كرێنەر ، داتاشەر |
| كاشف | Detector | دۆزەرەوە، هەر ئامرازێك بۆ دۆزینەوەی شەپۆلی كارەبایی یان چالاكی تیشك دانەوە بەكار بێت. |
| كاشف | Reagent = reactor | دەرخەر ، دۆزەرەوە، ئاسەرەوە، دۆزەر ، هەر ماددەیەكی كیمیایی بۆ ناسینەوەی نەخۆشی‌یەك یان ماددەیەكی كیمیایی تر بكار بێت. |
| كاشف ازباخ | Esbachs - re | دۆزەرەوەی ئەزباخ ، تێكەڵاوێكە لە ترشی پیكریكی ئاوی و ترشی ستریك (لیمونیك) بۆ دۆزینەوەی ماددەی ئەلبۆمین لە میزدا. |

**كاشف بواز** دۆزەرەوەی بواز - تێکەڵاوێکە لە مادەی ڕیزۆرسین و شەکرو ئەلکهولی ڕوون بۆ ناسینەوەی ترشی هایدرۆکلۆریك لە گەدەدا بەکار دێت.

**كاشف بارفويد** دۆزەرەوەی ( ناسەرەوەی ) بارفۆید، تێکەڵاوێکە لە سرکاتی مس (خلات النحاس) و سرکە بۆ ناسینەوەی مادەی دیکستڕۆز بەکاردێت.

**كاشف بيتيندروف** ناسەرەوەی بیتیندرۆف = بریتییە لە گیراوەیەکی پەیت لە کلۆریدی تەنەکۆز (کلۆریدی ستانۆز) لە ترشی هایدرۆکلۆریکی دوکەڵاوییدا ، بۆ دۆزینەوەی زەرنیق لە نێوان ئاوێتەکانی بزمۆث و ئەنتیمۆنیدا بەکاردێت.

**كاشف تريبتوفان** دۆزەرەوەی تریپتۆفان ، بۆ دۆزینەوەی شێرپەنجەی گەدە.

**كاشف تنريه** دۆزەرەوەی تەنریە ، تێکەڵاوێکە لە کلۆریدی جیوەو یۆدیدی پۆتاسیۆم و ترشی سرکە بۆ ناسینەوەی ئەلبۆمین لە میزدا.

**كاشف شويتزر - محلول شويتزر** دۆزەرەوەی شویتزەر - گیراوەی شویتزەر - گیراوەیەکی شینی تێرە لە تێکەڵاوی هایدرۆکسیدی سۆدیۆم و گۆگرداتی مس پەیدا دەبێت بۆ تواندنەوەی سللیلۆز بۆ ئامادەکردنی ئاوریشمی دەستکرد بەکاردێت.

**كاشف شيك** Schick test دۆزەرەوەی شیك مادەیەکە یان (تاقیکردنەوەیەکە) بۆ دۆزینەوەی نەخۆشی وەناق بەکاردێت.

**كاشف فرود** دۆزەرەوەی فرۆد : تێکەڵاوێکە لە مۆلیبداتی ستودیوم و ترشی گۆگردیك بۆ دۆزینەوەی مادە نیمچە ئەلکالییەکان.

**كاشف فرون** دۆزەرەوەی فرۆن ، تێکەڵاوێکە لە یۆدیدی پۆتاسیۆم و بزموث بۆ ناسینەوەی شەکرو مادە نیمچە ئەلکالییەکان.

**كاشف فريدمان - اختبار فريدمان** Friedmans test دۆزەرەوەی فریدمان ، تاقیکردنەوەیەکە بەسەر میزی ژندا دەکرێت بۆ ئەوەی بزانێت ئایا سکی پڕە یا نە؟

**كاشف كارنوت** دۆزەرەوەی (ڕابەری) کارنۆت ، ڕابەرێکی کیمیاییە بۆ دۆزینەوەی ژماردنی بڕی پۆتاسیۆم.

**كاشف گرينيارد - غرينيارد** Grignard دۆزەرەوەی گرینیارد ، کۆمەڵە دۆزەرەوەیەکی گرنگن لە کیمیای ئۆرگانیکی دەستکردا بەکار دەهێنرێت، بەیەك گرتنی کانزای مەگنیسیۆم لەگەڵ کلۆریدی یان برۆمیدی یان یۆدیدی ئۆرگانیکیدا بە بوونی ئیثە ڕو نەبوونی ئاو.

**كاشف ماير** دۆزەرەوەی مایەر : تێکەڵاوێکە لە مادەی سلەیمانی و یۆدیدی پۆتاسیۆم بۆ دۆزینەوەی مادە نیمچە ئەلکالییەکان

**كاشف ميلون** دۆزەرەوەی میلۆن ، تێکەڵاوێکە لە ترشی نیتریك و جیوەو ئاو بۆ دۆزینەوەی هەندێك لە مادە ئەندامییەکان.

**كاشف نسلر - محلول نسلر** دۆزەرەوەی نیسلەر : تێکەڵاوێکی ئاوییە لە یۆدیدی پۆتاسیۆم و کلۆریدی جیوەو هایدراتی پۆتاسیۆم بۆ ناسینەوەی ئامۆنیا.

**كاشف نيلاندر** دۆزەروەی نیلاندەر : گیراوەی بزمۆثی ئەلکالی بۆ دۆزینەوەی شەکر.

**كاشو - جوزة - بلاذر- انقردية** Anacardium پۆتیدیۆم دارو دەوەنێکە لە کۆمەڵەی قەزوان بەرەکەی دەخورێت ، مادەیەکی قلیەیی لە توێکەی دەردەهێنرێت زەمقی ئەکاجو (کاشو) لە قەدەکەی دەردەهێنرێت.

**كاشو كاد هندي** Cachou = Catechu مادەیەکی گیرکەری (دابغە) ڕەشە بۆ گەدە باشە دژی ڕەوانی بەکاردێت لە بەری درەختی کاشو واتە (کادی هیندی) دەردەهێنرێت، هەروەها بۆ دەباغ کردنیش بەکار دێت.

**كاشفة الكذب** درۆدەرخەر

| | | |
|---|---|---|
| كاشـــم - كاشـــن - انجـــزان رومــــي - شوكران جبلي | Lovage = Mountain hemlock = hartwort | كاشمە ، گیایەكی دەشتەكییە ، گوڵەكەی زەردە وەكوو چەتر وایە بەرەكەی وردو رەشە بۆ مەبەستی پزیشكی بەكار دێت، گەڵاكەی دەكرێت بە چێشت. |
| كـــــاعب = ناهدة | To have swelling = swelling breast = woman having well developed breasts | كچێك مەمكی كردبێت. |
| كاغد | Paper | كاغەز ، قاقەز |
| كاغد جام = ورقة السناذج - ورق الصنفرة | Sandpaper = | سمارتە ، كاغەزی سمارتە- بۆ لابردنی ژەنگ لە ئاسن كاغەزێكی زبرە وورده لم یان ووردە شووشەی پێوەیە. |
| كاف - كافي | Enough, sufficient | سەروبەر ، بەس |
| كـافئين = كـافـين - ثيئين | Caffein = Caffeine = Cafeine ($C_8H_{10}N_4O_2H_2O$) | (كافائین) ، مەتیل برۆمین = تیئین ، مادەیەكی قلیەیی پزیشكی بەهێزكەرو ووریا كەرەوەیە ، هەروەها مادەیەكی پرۆتینیە نەختێك تاڵە، لە بەرو گەڵای قاوەو چایی و كۆلاو كاكاو دەردەهێنرێت و دروستیش دەكرێت، بە شێوەی تۆپەڵی سپی شێوە خوریی یان بلوریی دەزولەیی هەیە، كەمێك لە ئاوو ئەلكهولدا دەتوێتەوە بەڵام بە باشی لە كلۆرۆ فۆرمدا دەتوێتەوە بێ بۆنە، زۆر خواردنی خراپە، لە خواردنەوەو مەیانی پزیشكیدا بەكار دێت. |
| كافور - صمغ الكافور | Camphor = gum - Camphor ($C_{10}H_{16}°$) | (كـافور) مادەیەكی رەقی كریستاڵی سپییە لە پلەی (١٧٥)° ی سەدیدا دەتوێتەوە، زوو دەبێت بە هەڵم ، لە چەوری درەخت دەردەهێنرێ، وەكوو درەختی كافورو رۆزماری و دارچین و داری قاج و كالیپۆس، بە كوڵاندنی لق و گەڵای ئەم درەختانە لە ئاودا بۆ سلیلویدو تەقەمەنی و دەرمان و بۆ دەركردنی مێروو ، بەكار دەهێنرێت. |
| كافور | Eucalyptus = Red-gumtree | داری كافور ، جورێكە لە درەختی یوكالیپتۆس، درەختێكی مەزنی بۆن خۆشە بەرەكەی شێوە زەیتونی هێلكەیی رەش مەیلەو بنەوشەیە، مادەی كافور لە تەختەكەی دەردەهێنرێت. |
| كافورية | | راجع (غرديب) |
| كافور الأنيسون | Anise Camphor = anethole | كافوری رازیانە، ئەنیثول بە شێوەی كریستاڵی سپی هەیە ، تامەكەی شیرینە. |
| كافوري | Camphor ated = Camphoric | كافوری - هەر شتێك پەیوەندی بە كافورەوە هەبێت. |
| كافورات | Camphorate | (كافورات)= خوێی ترشی كافوریك. |
| كافي - كابياء - كوبيـاء - قبعة - غنزيرغينا | Cavy = Guinea-pig = cobaya | (كـافی) - بەرازی هیندی - كۆبیا - كابیاء ، كاڤیا ، - بەرزای غینیا ، گیاندارێكی قرتێنەرە لە باشووری ئەمریكا دەژی. |
| كافا | Kavakava | (كاڤا)، جۆرێكە لەدەوەنی بیبەر لە رەگەكەی شەربەتێكی ژەهراوی دروست دەكرێت. |
| كاكا كاكه | Kaka | (كاكە) - شیشوا ، جۆرێكە لە توتی لە نیوزیلەندە دەژی. |
| كاكـاو- لـوز الألهـة - شجرة الشوكولاته | Cacao tree theobromacacao | كاكاو - درەختێكی بەرزە ، گەڵاكەی سەوزی مەیلەو سوورە گوڵەكەی بچووكە بەرەكەی لە خەیار دەچێت، تۆوەكەی دەردەهێنرێت و لەبەر هەتاو هەڵ دەخرێت و دەبرژێنرێت و دەهاڕرێت و بۆ خواردنەوە وەك قاوە بەكار دەهێنرێت، هەروەها بۆ دروست كردنی چوكلێت و تام و بۆنخۆشكردنی دەرمان و خواردەمەنی. |

**كاكاب** — Kakapo — (كاكاپۆ) جۆرێكە لە تووتی لە نیوزیلەندە دەژی.

**كاكتینومایسین** — Cactinomycin — (كاكتینومایسین) ، یەكێكە لە دەرمانەكانی دژە ژیان (مچادات الحیویە)

**كاكتوس - صبرة** — Cactus = torch thistle — جۆرێكی جوانو نایابە لە سوبێر ، هەنجیری دڕكاوی.

**كاكتوش شوكي - صبار قنفذي** — جۆرێكە لە سوبێر ، لە ژیشك دەچێت ، سوبێری ژیشكی

**كاكمبو - ضباب خفیف** — Cacimbo — (كاكمبۆ) ، تەمێكی سووكەڵە.

**كاكنج - حبوة كاكنجیة = صبو - حبو** — Alke kengi = winter cherry — (كاكنج) - كێكنجی ، جۆرە گیایەكە لە كۆمەڵەی باینجان گوڵەكەی بچووكو سپییە ، بەرەكەی ئەرخەوانیو توونە ، بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت.

**كاكو - نزیك** — Kakau = Norvalls — (كاكۆ) ، جۆرە مەیموونێكە.

**كاكودیل** — Cacodyl — (كاكۆدیل) - ئاوێتەیەكی كیمیاییە زەرنیقی تێدایە.

**كاكومیستل - اسید الجبل** — Cacomistle — (كاكۆمیستل) - شێرۆكەی چیایی ، گیاندارێكی گۆشتخۆرە لە راكوون دەچێت، بەڵام بچووكترە كلكی درێژە.

**كاكي** — Khaki — قوماشی خاكی ، قوماشێكە لە خوری یان لۆكە، جلو بەرگی سەربازی لێ دروست دەكرێت ، رەنگەكەی قاوەی مەیلەو زەردە.

**كاكي - بلح طرابزون - مشمش الیابان** — Kaki = per simmon tree = chinnese date plum — (كاكی)(خورمالو)، قەیسی جاپان، بێزوالاڕووك - درەختێكە جاری وا هەیە (١٠) م بەرز دەبێتەوە بەرەكەی پرتەقاڵییە، لە تەماتە دەچێت ، تفتو كەمێك شیرینە ، مرەبای لێ دروست دەكرێت.

**كالا - لوف زنبقي** — Calla = calla lily — (كاللا) - زەمەقی كاللا -لۆفی زەمەقی ، جۆرێكە لە زەمەق یان لۆف ، گەڵاكەی سپییە دەوری گوڵی زەردی داوە رووەكێكە لە كۆمەڵەی لفكە شامی.

**كالا بارابن - ایسرابن** — Calabarine = eserine = phy sostigmine ($C_{15}H_{21}O_2N_3$) — كالابارابن - ئیسیرابن - فایسوستیگماین ، مادەیەكی نیمچە قلیمییە ، بە شێوەی بلوری بێ رەنگ یان بنەوشەیی هەیە، كەمێك لە ئاودا دەتوێتەوە، بەڵام لە ئەلكهولدا دەتوێتەوە، زۆر ژەهرینە لە مەیانی پزیشكیدا بەكاردێت.

**كالادیوم - كلادیوم** — Caladium — (كالادیوم)، رووەكێكی پیازی جوانە گەڵاكەی رەنگینە بۆ رازاندنەوەی ناومال بەكاردێت.

**كالافیریت** — Calavarite — كالافیرایت - مەعدەنێكە بریتییە لە تیلورایدی تێر، رەنگێكی برۆنزی زەردی كاڵی ، یان سپی تەنەكەیی هەیە، بریسكەیەكی مەعدەنی هەیەلە (٤٠ ٤٣٪) زێرو لە (٣/٨٪) زیوی تیادایە كێشی جۆرییەكەی (٩) یە ، پتەوییەكەی ٥و٢لە ناوچەی كلۆرادۆ و كالیفۆرنیاو ئوسترالیاو كەنەدا دا هەیە.

**كالاكتین - غلاكتین** — Galactin — (گالاكتین) مادەیەكە لە تۆوی رووەكە پاقلەمەنییەكاندا هەیە لە زەمەق دەچێت.

**كالاكتوز - غالاكتوز** — Galactose — گالاكتۆز ، جۆرە شەكرێكە.

**كـــــالاكوس - اطفال الغابة** — Galagos = bush babies — منداڵانی دارستان (گالاگۆس) گیاندارێكی بچووكە لە مەیمون دەچێت، كلێكی درێژی هەیە، بە شێوەی كۆمەڵ لە ئەفریقادا دەژی، بە رۆژ لە هێلانەی گەورەدا دەنوون.

**كالامین - هیمیمورفیت - طبیعي - حجر التوتیا - كاربونات الزنك** — Calamine = hemimorphite Natural hemimorphite — كالامین - هیمومۆرفیتی سروشتی - بەردە توتیا - زینك كاربۆنەیت، یەكێكە لە كەرەسە خاوەكانی:

١- كانزای زینك

٢- زینك سلیكەتی ناویی بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت.

سلیكاتی زینك بە شێوەی بلوری رۆشن لە دەنكە برنج دەچێت ، ئەگەر پاك بێت رەنگەكەی سپییە بەڵام هەندێ جار رەنگاو رەنگە.لە ئەمریكاو ئەوروپادا هەیە.

| | | |
|---|---|---|
| کالانش - زهرة اللبن | Galan thus = snowdrop | گیاشیر - گیاماست - گیایەکە لە کۆمەڵەی نێرگز. |
| کالبتوس - ئوکالبتوس - شجرة الحمی - شجرة صمغ الأزرق | Eucalyptus = | یوکالیپتۆس ، درەختی یوکالیپتۆس، درەختێکی گەورەیە لە کۆمەڵەی مۆرد گەڵاو گوڵەکەی لە مەیانی پزیشکی دا بەکار دێت هەروەها بۆنێکی خۆشیان لێ دەردەهێنرێت. |
| کالح الوجه | Austere = stern = gloomy | مۆن ، ڕووگرژ |
| کالدیرا - جفرة - فوهة برکانیة | Caldera = basal wreck | (کالدێرا) - زاری یان حەوزی گڕکانێك شێوەیەکی بازنەیی هەیە، تیرەکەی سێ ئەوەندەی تیرەی بنکەکەیەتی دیوارەکانی لێژن، بۆ نموونە دەریاچەی کرێتەر لە ویلایەتی (ئۆریگۆن)ی ئەمریکی گڕکانێکی خامۆشی تێدایە بە شێوەی دوورگەیەکی بچووك. |
| کالسایت - کالکسپار | Calcite = Calcspar | کالسایت - کالکسپار - کاربۆناتی کالسیومی سروشتی باو، گەلێك جۆری هەیە، وەکو ئایسلاندسپار (Iceland spar) ساتین سپار (Satin spar) دۆگ توث سپار (dog tooth spar) بە شێوەی بلووری بێ ڕەنگ یان سپی یان هەمەڕەنگ هەیە ، بریسکەیەکی شووشەیی هەیە بە باشی درز دەبات، هەندێ جار بڕی کەمی لە مەگنیسیوم ، ئاسن، مەنگەنیز ، زینك ی تیادایە، کێشی جۆرییەکەی (٧٢و٢) پتەوییەکەی (٣) لە ئامرازی بینایيدا بەکاردێت، لە بەردە ئاگرین و بەردە نیشتووەکاندا هەیە. |
| کالستمون - قلسطمون - فرشاة القناني - فرشة الزجاجة | Callistemon = | فلچەی شووشە ، درەختێکی هەمیشە سەوزە گەڵاکانی بۆنێکی خۆشیان هەیە لە بۆنی مۆرد دەچێت، گوڵەکانی بە شێوەی هێشوون ، لەو فلچەیە دەچێت کە بۆری شووشەی پێ پاك دەکرێتەوە، (٢٠) جۆری هەیە. |
| کالسیتونین | Calcitunin | کالسیتۆنین ، هۆرمۆنێکی ثایرۆیدییە بە دەست بەسەر ڕێژەی کالیسیۆم لە خوێندا دەگرێت و لە چارەکردنی ئێسکی شکاودا بەکاردێت، لە لووی ثایرۆیدی بەراز دەردەهێنرێت. |
| کالسیدونی - عقیق ابیض | Chalcedony | (کالسیدۆنی) یاقیقی سپی ، بەردێکی بە نرخە جۆرێکە لە سلیکا بە زۆری ڕەنگەکەی سپی یان خۆڵەمێشی یان ڕەشە. |
| کالسیفیرول فیتامین D2 | $D_2 (C_{28}H_{44}O)$ | کالسیفیرۆل ، – ڤیتامین (دی ٢) بە شێوەی بلوری بێ ڕەنگی سپی هەیە هەواو ڕوناکی کاری تێدەکەن، لە ئاودا ناتوێتەوە، بەڵام لە ئەلکهولدا دەتوێتەوە لە مەیانی پزیشکێتی و خۆراك پێدان و پارێزکردندا بەکاردێت، هەروەها بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی ئێسکە نەرمی بەکاردێت. |
| کالسیمین - کالسومایین | Calcimine kalsomine | کالسیمین - کالسۆمایین ، تۆزێکە بریتییە لە دەباشیرو سرێش لە ئاودا دەتوێتەوە لە لەوحی پلاستیك هەڵدەسورێت بۆ دیکۆر. |
| کالسیوم - کلسیوم | Calcium | کالسیوم، توخمێکی کیمیاگەری یە کێشی ئەتۆمییەکەی ، (٤٠) وە ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٢٠) ە ، کانزایەکی سپی زیوییە، نەرمە ، ناوەکەی لە ووشەی (کالکس) واتە قسڵ وەرگیراوە، نیشانەکەی (ca) لە بەردی قسڵ و ئێسکدا هەیە، لەپەیکەری ئێسکدا هەیە. |
| کالسیوم – ٤٥ | Calcium 45 | کالسیۆم ٤٥ هاوتایەکی چالاکی تیشك دەرەوەی کالسیۆمە ، ژمارەی باراستاییەکەی (٤٥) نیوەی تەمەنەکەی (١٦٤) ڕۆژە، تیشکی بیتا (BETA) دەداتەوە، تیشك دانەوەکەی ترسناکە ، ئەم هاوتایە ڕەدوی تیشك دەکەوێت، لەبەر ئەوە دەشێت ببێتە هۆی زیان لە پێکهێنەرەکانی خوێندا ، بۆ خوێندن و لێکۆڵینەوە لە پالاوتنی ئاوو گۆڕینەوەی کالسیوم لە قوڕەکاندا و پاککردنەوەو مژین و نیشتنی کالسیوم لە ئێسکدا ڕادەی سود وەرگرتنی خاك لە مادە بە پیت کەرەکان و بەرهەم هێنانی بەروبومدا بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| کالستو | Callisto | (کالیستۆ) پاشکۆی هەسارەی بەرجیسە (مشتری) لە ئەستێرەکەوە (١١٧٠x ٣٠) میل دوورە، تیرەکەی (٢٩٠٠) میلە. |
| کالکوبایریت | Chalcopyrite = Copper pyrites | (کالکۆپایرایت) یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی مس بریتی‌یە لە گۆگردیدی مس و ئاسن، رەنگەکەی زەردە یان مسی‌یە واتە سووری مەیلەو پەمبەیی، لە کەمرۆ ئاگرینەکاندا هەیە، کێشی جۆری (٤/١ ٤/٣) پتەوی‌یەکەی (٣/٥ ٤) لە مۆنتاناو یۆتاو ئەریزۆناو، تەنیس‌وئەوروپاو شیلی‌و کەنەدا دا هەیە، کەرەسەیەکی خاوی گرنگی مسە. |
| کالکوسیت - نحاس البراق | Chalcocite = Copper glance | کالکۆسیت ، بریتی‌یە لە گۆگردیدی مس رەنگەکەی رەش مەیلەو خۆڵەمێشی یە ، کێشی جۆریی (٥/٥ ٥/٨) پتەوی (٢/٥ ٣) ، لە مۆنتاناو ئەریزۆناو نیڤاداو ئالاسکاو چیلی‌و مەکسیکۆ و ئەوروپادا هەیە، کەرەسەیەکی خاوی گرنگی مسە، یاسای کیمیایی ($Cu_2S$) |
| کالو | Callus | کالوس ، مێخەکی قاچ ، بزماری قاچ بزماری پەنجە، بریتی‌یە لە پارچەیەکی رەقی وشکەوە بوو لە پێست بە هۆی پاڵەپەستۆوە لەسەر پەنجەی قاچ پەیدا دەبێت. |
| کالودندرون - شجرة البهاء | Calodendron | دەرختێکی جوانە بۆ رازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت. |
| کالوري = سعرة | Calorie | کالۆری - گەرمۆکە = یەکەی پێوانی گەرمی بریتی‌یە لە بڕی ئەو گەرمی‌یەی کە پێویستە بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گەرمی یەك گرام لە ئاو یەك پلەی سەدی. |
| کالورية = سعرية | Calories | کالۆریسێنس = کالۆرێتی - دیاردەی دەرهاتنی روناکی لە ئەنجامی مژینی تیشکی گەرمی کە درێژی شەپۆلەکەی درێژتربێت. |
| کالوریمیتر - مسعر | Calorimeter | کالۆریمەتر ، دەزگایەکە بۆ پێوانی بڕی گەرمی ( ئەوەی کە لە لێك خشاندن یان تەقینەوەدا پەیدا دەبێت). |
| کالوش - خف = جرموق = كالة | Half boots = slippers = gaiters | کاڵە ، کالۆش ، گێترە، کلاش ، شەکاڵ ، جۆرە پێڵاوێکە ژێرەکەی لە پەڕۆ و سەرەکەی بە دەزوو یان بەن دەچنرێت. |
| کالومیل= زئبق حلو | Calomel | کالۆمێل ، جیوەی شیرین ، بریتی‌یە لە کلۆریدی جیوۆز بە شێوەی دەرمانی رەوانی بەکاردێت. |
| کالومبا - ساق الحمام | Calumba | (کالومبا) - لاقە کۆتر - توێژاڵێکی ووشك کراوەیە لە رەگی رووەکێکی خۆرهەلاتی دەردەهێنرێت ، لە ئەفەریقا دەروێت، مادەی ئەلکالویدی و مادەی تاڵی تێدایە، دەرمانی دژی ئینتەلای لێ دەردەهێنرێت. |
| کالونا | Calluna | (کالۆنا) ، رووەکێکە گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی قیتی درێژی پەمبەیی‌یە. |
| کالیباش | Calipash | کالیباش ، مادەیەکی ولۆلەیی مەیلەو سەوزە لەژێر قاوغی سەرەوەی کیسەڵدا هەیە، دەخورێت. |
| کالیبایت | Chalybite | (کالیبایت) یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی ئاسن، بریتی‌یە لە کاربۆناتی ئاسنۆز. |
| کالیبیت | Chaly bite | (کالیبایت) ن کاربۆناتی ئاسنی سروشتی. |
| کالیبیة | Calipee | (کالیپی) مادەیەکی ولۆلەیی مەیلەو زەردە لەژێر قاووغی خوارەوەی کیسەڵدا هەیەو دخورێت. |
| کالیدوسکوب - مشکال | Kaleidoscop | (کالیدۆسکۆپ) ئامرازێکە چەند پارچە شوشەیەکی تیادایە کە ئیشی پێ دەکرێت چەند شێوەیەکی ئەندازەیی هەمەرەنگ پیشان دەدات. |
| کالیش | Caleche | (کالیش) ، عەرەبانەیەکی سەر بەرەڵایە زۆر سوکەڵەیە، چوار پێچکەی هەیە لە پێشەوە کورسی‌یەکی دانیشتنی تیادایە ئەم عەرەبانەیە بە زۆری لە ئاهەنگەکاندا بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| كاليشة - نترات شيلي - كاليجي | Caliche | (كاليچي - كاليشي) كەرەسەيەكی خاوە لە وڵاتی شیلیو پیرۆدا هەیە، لە بنەڕەتدا نیتراتی سۆدیۆمی سروشتی تێدایە. |
| كاليفورنيوم CF | Californium | (كاليفۆرينۆم)، توخمێكی دەستكردی چالاكە لە تیشك دانەوەدا ، لە كۆمەڵەی ئەكتینایدەكانە ژمارەی ئەتۆمی (٩٨) و كێشی ئەتۆمی یەكەی (٢٥٢) چەند هاوتایەكی هەیە، چەند ئاوێتەیەكی ناسراوی هەیە وەكو : سێیەم ئۆكسید، چوارەم فلۆرید، سێیەم كلۆرید ، هاوتا (٢٥٢) ە كەی لە شی كردنەوەی چالاك كردنی نیوترۆندا بۆ بەردەوام تاقیكردنەوەی مادەكانو گەڕان بە شوێن مەعدەنەكاندا ، لەمەیانی بایۆلۆجیدا توخمێكە بە شوێن ئێسكدا دەگەڕێت ، هەروەها لە مەیانی دەرمانسازیدا بەكاردێت، بەناوی (كاليفۆرنیا) شارێكی ئەمەریكاوە ناونراوە. |
| كاليكو(قماش) | Calico | چیت ، جۆرە قوماشێكە لە لۆكە دروست دەكرێت. |
| كالينا - رهج | Calina | كالينا |
| كالينا - غالينا | Galena | (گالینا) - مەعدەنێكە بریتییە لە گۆگردیدی قورقوشم ، رەنگەكەی خۆڵەمێشییە ، یەكێكە لە كەرەسە خاوە گرنگەكانی قورقوشم. |
| كاليوم | Kalium | (كاليوم) بە زمانی لاتینی مانای كاربۆناتی پوتاسیومە. |
| كاما - غاما | Gamma | گاما   پیتی سێیەم لە ئەلف وبێی زمانی یۆنانیدا |
| كاما كلوبيولين | | گاما گلۆبیولین |
| كامبو - سافانابرازيلية | Gampo | كامبۆ - دەشتێكی گیاداوییە لە بەرازیلدا. |
| كامبيوم - كمبيوم | Cambium | (كامبیۆم) چینێكە لە شانەیەكی (ئەتەمێكی) نەرم لە قەدی رووەكداكەوتۆتە نێوان گەڵو تەختەوە ، بە رێگەی دابەش بوون شانەكانی زیاد دەكات دەبێتە هۆی گەورەبونی تیرەی رەگو قەدی رووەك. |
| كامبيوم وعائي كامبيوم حزمي | | كامبیومی بۆری دار، كامبیومی لوولەیی |
| كامبيوم فليني | Cork Cambium | كامبیومی تەپەتۆری |
| كامة - بافية | Cam wood = baphia | بافیا ، درەختێكی ناوچە گەرمەكانە تەختەكەی قورسو بۆن خۆشە رەنگێكی سووری لێ دەردەهێنرێت. |
| كامة | Kame | كامێ - گردۆڵكەیەكی قوچەكییە لە لمو چەو پێك هاتووە. |
| كامخ - مخلل | Pickles | ترشیات ، سۆڵەكە. |
| كامد | Dull | بێ بریسكە. |
| كامفان | Camphane | (كامفان) ئاوێتەیەكی ئەندامییە لە كافور دەچێت. |
| كامفورين | Champhorene | كامفۆرین، مادەیەكە لە رۆنی كافوردا هەیە. |
| كامفين | Camphene | كامفێن ، بە شێوەی بلووری بێ رەنگ هەیە، لە ئاودا ناتوێتەوە، كەمێك لە ئەلكهولدا دەتوێتەوەلە مەیانی پزیشكیداو دروست كردنی كافوردا بەكار دێت. |
| كامل | Integrate | تەواو ، پێگەیشتو ، ئاهل |
| كامل الاوجه | Holosymmetric | روو تەواو   ع |
| كامل الاستحالة | Holometabulous | ئەو مێروانەی كە سوڕی ژیانیان تەواوە واتە : گەرا ، كرمۆكە ، میتولكە ، باڵق بوون وەكو لە مێرووی كرمی ئاوریشمدا. |

| | | |
|---|---|---|
| كامن | Latent = hidden | شاراوه ، نهێنی ، نادیار ، بهرزه. |
| كاموزيت | Chamosite | كامۆزیت ، كهرهسهیهكی خاوی ئاسنه سلیكاتی ئاسنی ئاویی تێدایه. |
| كاميرا | Camera | كامیرا ، فۆتۆگراف ، ئامرازی وێنهگرتن. |
| كاميرا تحليلية | | كامێرای شی كردنهوهیی ، كامێرایهكی ئهلهكترۆنی‌یه له تهلهفزیۆن. |
| كاميرا خاطفة | Candid Camera | كامێرایهكی بچووكه وێنهی خێرایی كت‌و پڕی پێ دهگیرێت. |
| كاميرا ضيائية | | كامیارای ڕووناكی‌یانه. |
| كاميليا | Camellia = Japan Rose | كامیلیا ، دهوهنێكی ههمیشه سهوزه سسته له گهورهبونا ، له (٣) سێ مهتر زیاتر بهرز نابێتهوه ، گهڵاكانی به شێوهی هێلكهیی ، گوڵهكانی گهورهیه، ڕهنگێكی سپی یان سوور یان مێخهكی‌و بریسكهداره بۆ ڕازاندنهوهی باخچهكان دهروێنرێت. |
| كاميلية - سسم الفانيا | gold of pleasure | (كامیلینا) ڕووهكێكه له كۆمهڵهی خاچی‌یهكان ، ڕۆنێك له تۆوهكهی دهردههێنرێت له وێنهكێشان‌و دروستكردنی سابون دا بهكار دێت. |
| كاميو | Cameo | كامیۆ - بهردێكی به نرخه نهخشی ئاشكراو بهرزی تیادایه. |
| كاميليدي | | كۆمهڵهی ووشترو لاما |
| كانامايسين | Kanamycin | (كانامایسین) دهرمانێكه دژی میكرۆب بهكاردێت، به شێوهی دهرزی ههیه. |
| كانة | Bolt = stirrup | شیش ئاسن. |
| كانتريسين | Gantrisin | (گانتریسین) جۆرێكه له قهترهی چاو. |
| كانتيل | Cantil | (كانتیل) دهرمانێكه بۆ كهمكردنهوهی دهردانی مادهی (كولین) ڤیتامینێكه ناهێڵێت چهوری له جگهردا كۆ ببێتهوه ، بۆ چارهسهركردنی رووشاندن‌و برینی كۆڵۆن (ریخۆڵه) بهكاردێت، به شێوهی حهب ههیه. |
| كانتين | Canteen | كانتین - بازاڕی سهربازهكان- دوكانێك بۆ شت كڕین له لایهن ئهفسهرو سهربازهكانهوه. |
| كانسة الألغام | Minesweeper | لهغهم ڕاماڵ - مین ڕاماڵ ، كهشتی‌یهكی جهنگی‌یه مینی ناو دهریا لادهبات |
| كانسة العقبات | Cow catcher | تهگهره لابهر - گهسكی تهگهره ، ئامرازێكی مهعدهنی‌یه ، له پێش شهمهندهفهردا بۆ لابردنی كۆسپ‌و تهگهره. |
| كانسة الثلج - كاسحة الثلج | | بهفرماڵ ، بهربهره. |
| كانشيل الملايو - الغزال الفار | Kanchil | (ئاسكه مشكی - كانشیل) گیاندارێكی شیردهری كاوێژكهری سمداری بچووكه به قهدهر كهروێشك دهبێت، له مشك‌و ئاسك دهچێت، بهڵام شاخی نی‌یه، بهرزی‌یهكهی له زهوی‌یهوه نزیكهی(٢٠) سم دهبێت. |
| كانون الأول | December | كانونی یهكهم، بهفران بار ، دوانزهههمین مانگه، ٣١ ڕۆژه ، ١-٢١ سهماوز ٢٢ ٣١ بهفران بار. |
| كانون الثاني | January | كانونی دووهم، چلهشۆر ، مانگی یهكهم ، ئهكهوێته زستانهوه ،٣١ ڕۆژه . ١- ٢٠) بهفران بار ٢١-٣١) ڕێ بهندان |
| كانون - موقد - وجاق | Fire place = stove = hearth | مهقهڵی ، وهجاخ ، ئاگردان |
| كانميد - غانميد - جانميد | Ganymede | گانمید ، پاشكۆی ههسارهی بهرجیسه (مشتری) له ئهستێرهكهیهوه ١/٦٦٥ $\times 10^{7}$) میله تیرهكهی (٣١٣٠) میله له ساڵی ١٦١٠ دا زانا گالیلۆ دۆزیویهتی‌یهوه. |

| | | |
|---|---|---|
| كانيش | Poodle | رەگەزێکە لە سەگ، تیسکنە. |
| کاهل | Upper part of the back | سەرشان ، ئەستۆ ، سەرەوەی پشت لە ژێر ملدا ، ناوشان ، نێوان پشتو مل. |
| کاهل الفرس = حارك | Withers | سەرشانی وڵاخ. |
| کاوتشوك = مطاط | Caout Chouc | کاوچۆك ، لاستیکی سروشتی ، شلەیەك لە درەختی لاستیك دەردەهێنرێ. |
| کاوة = فلفل کاوة | Kave | کافە بریتی‌یە لە رەگو زەمقی جۆرە بیبەرێك بـۆ مـیزکردن و سـەرخۆش کردن بەکار دێت. |
| کاوری = صنوبر الکاوری | Kauri = Ka | کاوریی ، سنەوبەری کاوری ، جۆرێکـە لـە سـنەوبەر زەمقی کـاوریی لـێ دەردەهێنرێ. |
| کاوزان = حجم مخزني | Borage = tale wort | زمانەگا ، گازمان ، گیایەکی دەشتەکی پزیشکی‌یە، گوڵەکەی لە ئەستێرە دەچێت ، شینە ، گەڵاو گوڵەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بـەکار دێـت، بـۆ مەبەستی میز پێ کردنو چارەکردنی کۆکەو تامێسك. |
| کاوشـیر = جاوشـیر = سیسارون البري | Apopanax = Allheal | روەکێکی دەشـتەکی رەگ ئەسـتورە گەڵاکـەی ئاوێتەیـە لـە پـەڕ دەچێـت گوڵەکەی زەردو وردە زەقمێکی رێسینی لـێ دەردەهێنرێ ، بۆ مەبەستی بۆن خۆشیو پزیشکی. |
| کاؤلین الصلصال الصیني | Kaoline | کائولین ، گڵەچینی ، مەعدەنێکە بریتی‌یە لە سلیکاتی ئەلەمنیومی ئاوی ، لە دروست کردنی کاغەزو لاستیكو فەخفوریو بە تایبەتی قاپی چینیو پۆرسلیندا بەکار دێت. |
| کاؤلینیت | Kaolinite | (کائۆلینـایت) = کەرەسـەیەکی خـاوی ئەلـەمنیۆمو سـلیکۆنە، ئەلـەمنیۆمو سلیکۆنو ئۆکسجینو هایدرۆجینی تیادایە، رەنگەکەی سپی یـان سـوور یان خۆڵەمێشی‌یە. |
| کاوي = کاو | Caustic = burning | داخکەر ، سوتێنەر ، وەکو مادەی سوێدەی داخکەر. |
| کاي کي | Kea | کای - کیا ، جۆرێکە لە تووتی لە نیوزیلندە دەژی. |
| کایتون | Chiton | چیتۆن - گیانداریکی دەریای نەرمە وەکو گوێچکەماسی. |
| کئیب | Depressive = depressed | لۆش ، لۆژ ، زویر ، مات ، خەمبار ، خەمگین. |
| کـایمن - کیمـن = تمساح امریکي | Caiman = American Crocodile | کایمان ، جۆرە تیمساحێکی ئەمریکی گەورەیە . |
| کبا ، کبي ، مزبلة | Dunghill | سەرنوێلك، گیفانکە. |
| کباب | meat = kabab = Cabab | کەباب ، قیمەی برژاو بە شیشەوە لەسەر خەڵوز |
| کبابجي | Prorietor | کەبابچی. |
| کبابـة ، فلفـل کبابـة - حب العروس | Cubebs = piper cuteba | کەبابە ، روەکێکە وەك بیبەر وایە بەرەکەی بریتی‌یە لە بەهارات ، هـەروەها دەرمانی لـێ دەردەهێنرێت ، بۆ چارەکردنی نەخۆشی ئاژەڵو وڵاخ ، لـە چارەکردنی پشێوی رێبازی میزو بۆریچکەکانی هەناسەدا بەکار دێت. |
| کبابة صیني | Jamaica - pepper | کەبابەی چینی، |
| کباث - اراك - شجرة السواك | Tooth brush tree | داری سیواك، دەونێکـە رەگەکـەی تیـژو سـوتێنەرە ، بەرەکـەی تیـژو سـوتێنەرە، بەرەکەی وەك ترێ وایە زەردە دەخورێت لاسکەکەی بۆ ددان ئاژنین بەکاربێت. |
| کباح - منع | In hibition | نەهێشتن |
| کباحة - فرمل | Brake | برێکی ئوتومبێل |
| کباد = التهاب الکبد | Hepatitis = liver disease = hepatosis = liver complaint | ئێشو ئازاری جگەر ، سوتانەوەی جگەر. |

| | | |
|---|---|---|
| كباد الغنم | | كرمی جگەر ، نەخۆشی پەپولە لە مەڕو ماڵاتدا. |
| كباس | Piston | پیستۆن - پیستم ، خەپلە یەك یان لولەیەكی پتەوە ، دەخرێتە بۆڕی ترومپاوە لە جولێنەرێكدا هاتو چۆ دەكات. |
| كباسة - قنو - قناء | Bunch = Cluster | هێشو ، هێشوی خورما. |
| كباش - لقمة النعجة | Spogel -plantain | زمانە بەرخ ، گیایەكی دەشتەكی پزیشكی‌یە لە شوێنی شێداردا دەروێت. |
| كباشة هوجن | Rake | شانەی زەوی رێكخستن بۆ كشتوكاڵ. |
| كبان | | جۆرە نەخۆشی‌یەكە پەنجەكان ئەستورو زبر دەبن ، نەخۆشی‌یەكە دەدات لە وشتر گلۆڵەو سستی دەكات. |
| كبيبة | Glomerulus | كلافۆكە - كلافەی بچوك |
| كبت | Inhibition = repression = stiffle | پەچاندن - پەچاندنە دڵ ، پركێش ، دەرنەبڕین. |
| كبت جنسي | Sexual repress | پەچاندنی رەگەزی ، پركێشی رەگەزی شاردنەوەی ئارەزوو ، رەگەز حەشار. |
| كبة - طاعون - رملي | Bubonic plague | سنگانی دومەڵی - جۆرێكە لە نەخۆشی سنگان. |
| كبة الغزل | Ball of threa | گلۆلە ، گروف |
| كبة ثلج | Ball of snow | كلوی بەفر. |
| كبة خديعة | Meat balls paste of mashed meat and pearl wheat | كفتە ، كوتلك ، خڕیلە ، كوبە |
| كبة - كبيبة | Glomera | گلۆلە ، كلافە |
| كبح - ردع | Control = Curb | دامركاندنەوە ، لغاو لێ توندكردن ، سەركوت كردن. |
| كبح النفس | Continence | دان بەخۆداگرتن ، بە تایبەتی بۆ ئالۆشی رەگەزی. |
| كبد | Liver = hepar =Jecur | جەرگ / جگەر ،كەزەبە ، كەزەب ، گەورەترین لووە (گلاند) لە لەشی مرۆڤدا مادەی زراو دروست دەكات ، دەكەوێتە لای راستی سكەوە خانەكانی جگەر بەردەوام ، مادەی كلوكۆز دەگۆڕێت بۆ گلایكۆجین. |
| كبداني | Liverish | جگەریی ، هەر شتێك شێوەكەی یان رەنگەكەی لە جگەر بچێت. |
| كبد الأسد | Kabed Ased | جگەری شێر ، ناوی ئەستێرەیەكە بە عەرەبی. |
| كبدمتشمعة | | جگەری ریشاڵاویی بوو ، جگەری مۆماویی بوو. |
| كبدي | Hepat = Hepato = Hepatic | پێشگرێكە بە مانای جگەریی - جگەری - هەر شتێك پەیوەندی بە جگەرەوە هەبێت. |
| كبدية | Liver wort | گیا جگەر ، كۆمەڵە روەكێكن لە تاقمی (برایوفاینا)ووەكە كوركوزەكان، نیمچە رەگیان هەیە. |
| كبر - كبار - قبار - اصف - شفلح | Caper tree = Capparis | شەفلە ، شیفلەتە ، كەبەر ، دەوەنێكە گوڵێكی سپی یان پەمەی یان زەرد، یان سوور دەگرێت، لە ناوچە بیابانەكان و خلەندەكان دەروێت، بەرەكەی لە خەیارێكی بچوك دەچێت پێی دەوترێت شیفلەتە ، دەخورێت و دەكرێتە ترشیات رەگەكەی بۆ مەبەستی پزیشكی بەكار دێت. |
| كبر - ضخامة | Mega = megalo | پێشگرە بە مانای مەزنی یان گەورەیی |
| كبر البطن | Megagastia | ورگ زل. |
| كبر الأذن | Macrotia | گوێ زل. |
| كبر الاسنان | Megadontia | ددان زل |
| كبر السن | Oldness | پیریی - زۆری تەمەن. |

| | | |
|---|---|---|
| كبر الأقدام | Megalopodia | پێ زلی. |
| كبر الكفل | Staatopygia | کەفەل گەورە - سمت گەورە. |
| كبر القلب | Caraliac enlargement | دل گەورەیی - دل زلی. |
| كبره | | بەری گوێزی هیندی. |
| كبراشو - كيبراشو - كبراش | Quebracho | (كيبراشۆ)، درەختێکە لە ئەرجەنتین دەروێت، توێکڵەکەی تاڵە، بۆ دەرمان و دەباغ کردن بەکار دەهێنرێت، هەروەها سوود لە تەختەکەشی وەردەگیرێت. |
| كبر الفربيون - ماهودانة | Caper spurge = wild Capev | (کاپێر سپەرج)، شیرماری شیفەلەتەیی جۆرێکە لە رووەکی شیرمار، (یوفوربیا)، شیراوێکی ژەهری تیایە، جاران ،بەرە بچوکە سەوزەکەی دەکرایە زەلاتەوە. |
| كبرتة - سلفنة - سلفرة | Sulphorization = sulphuring | گۆگرداندن -تۆخمێکی گۆگرد بکرێتە مادەی ترەوە وەکو ئەوەی کە بکرێتە لاستیکەوە. |
| كبرتل | | نێرە قالۆنچە. |
| كبرميس | Capromys | کابرۆمایس، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە، لە مشک دەچێت بەلام گەورەترە، نزیکەی نیو مەتر درێژە، چاو گەورەو مل ئەستورە لەناو بێشەلاندا دەژی. |
| كبرومة | Coprosma | کۆپرۆسما، جۆرە رووەکێکە بۆ رازاندنەوەی باخچەکان. |
| كبريت S | Sluphur=brimston = sulfur | گوگرد، سولفەر، توخمێکی کیمیا گەرییە، ناکانزاییە، زەردە، ئەتۆمەکەی (٣٢) و ژمارە، ئەتۆمیەکەی (١٦) یە، گەلێک سوودی لە پیشەسازییدا هەیە وەکو لە پیشەسازیی ترشی گۆگردیک و باروت و شقارتەو کاغەزو پەین. |
| كبريتي | Sulphurous = sulphuric | گۆگردی، هەرشتێك پەیوەندی بە گۆگردەوە هەبێت. |
| كبريتات - زاج | Sulphate = sulfate | گوگردات - سولفەیت، خوێی سۆلفەریت ئەسید، رەگێکی کیمیاییە هاوهێزییەکەی (٢). |
| كبريت العمود - كبريت عمودي | Brimstone = rollsulphur | گۆگردی ستونی. |
| كبريت زهر | flowers of sulphur | گوڵە گۆگرد، تۆزی گۆگرد |
| كبريت معيني | | گۆگردی لەبزینەیی. |
| كبريت منشوري | Prismatic-sulfur | گۆگردی پوازی. |
| كبريت رسوبي | | گۆگردی نیشتەنی (نیشتوو). |
| كبريت غير متبلور | | گۆگردی نابلووری. |
| كبريت مطاطي | | گۆگردی لاستیکی |
| كبريت مشع | | گۆگردی تیشك دەرەوە بە هۆی ئەم گۆگردەوە زانراوە کە پەری مریشك چۆن دروست دەبێ. |
| كبريتات الألمنيوم - شب | Aluminium sulfate | گۆگرداتی ئەلەمنیۆم - زاخ، بە شێوەی بلووری سپی هەیە، لە دروست کردنی زاخ و جێگیرکردنی رەنگ لەسەر قوماش و دەباغ کردنی پێستەی سپی و هتد. بەکاردێت، یاسای کیمیایی $AL_2(So4)_3 18H_2o$ |
| كبريتات الأنتمون | | گۆگرداتی ئەنتیمونی، بە شێوەی تۆزێکی سپی هەیە، لە دروستکردنی شقارتەدا بەکاردێت، یاسای کیمیای - $Sb_2(So4)^3$ |

| | | |
|---|---|---|
| كبريتـات الامونيـوم = كبيرتات النشادر | | گۆگرداتی ئامۆنیۆم ، به شێوەی بلووری سپی مەیلەو قاوەیی هەیە، لە دروستکردنی پەین و سازدانی ئاوو ترشاندن (تخمیر) و رادیۆن و دەباخچێتیدا، بەکاردێت، یاسای کیمیایی$(NH_4)_2SO_4$ |
| كبريتات الباريوم | barytes = (Baso4) | گۆگرداتی باریوم، باریوم سولفەیت - بارێت ، تۆزێکی سپی یان (مەیلەو زەرد)ی بێ بۆنە، بێ تامە، لە دروست کردنی کاغەزی تایبەتی و بۆیەو لاستیک و پلاستیک و مەرەکەبی تایبەتی و وێنەگرتنی فۆتۆگرافی و پاتریدا بەکاردێت. |
| كبريتات البنزيدين | Benzidine sulfate | گۆگرداتی بەنزیدین، تۆزێکی بلووری سپی‌یە. لە ئامادەکردنی مادەی ئەندامیدا بەکاردێت. یاسای کیمایی - $C_{12}H_{12}N_2HSO_4$ . |
| كبريتات البزموت | Bismuth sulphate | گۆگرداتی بزمۆ ث ، به شێوەی دەرزیله یان تۆزی سپی هەیە، لە دروست کردنی دەرماندا بەکاردێت یاسای کیمیای - $Bi_2(SO_{4_3})$ . |
| كبريتاتات الرصاص القاعدية - الرصاص الأبيض | Basic lead sulfate | گۆگرداتی قورقوشمی تفت، قورقوشمی شین. |
| كبريتات الرصاص - رصاص ازرق | Galena = lead sulfate = blue lead | گالینا، گۆگرداتی قورقوشم = قورقوشمی شین ، کەرەسەیەکی خاوە، قورقوشم و گۆگردو زیو و ئاسن و توتیاو کلی تیادایە، رەنگەکەی خۆڵەمێشی‌یە، بۆ رووکەش کردنی فەخفوری بەکاردێت. |
| كبريتات السيريوم - كبريتات السيريك | = sulfate | گۆگرداتی سیریوم ، مادەیەکی کیمیایی‌یە به شێوەی تۆز یان بلووری سپی یان سوری مەیلەو زەرد هەیە، یاسای کیمیایی $Ce_2(SO_4)_3\ 8H_2O$ لە دروست کردنی بۆیەو چاپ کردنی قوماش دژی ئاو به بکاردێت. |
| كبريتات حامضية | bisulfate | بای سولفەیت، خوێی ترشی گۆگردیك هایدرۆجینی تێدایە. |
| كبريتات السيزيوم | | گۆگرداتی سیزیوم به شێوەی بلووری بێ رەنگ هەیە، لە ترشاندنی ئاوی کانزاییدا بەکاردێت یاسی کیمایی $CS_2SO_4$ . |
| كبريتات الكوبلت | Cobalt | گۆگرداتی کۆباڵت ، به شێوەی تۆزێکی سوور هەیە، لە ئاودا دەتوێتەوە لە دروست کردنی سیرامیك و بۆیەو رووکەش کردن بەکۆباڵت دەکرێتە خاك و ئالیکی ئاژەڵەوە ، وەکو کارکەرێکی یاریدەدەریش بەکاردێت. |
| كبريتات النحاس المائية - زاج ازرق | Blue Vitriol = Copper sulfate | گۆگرداتی مس ، کۆپەر سولفەیتی ئاوی زاجی شین. |
| كريتات الحديدوز المائية - زاج اخضر | Green Vitriol = Green Copperas = ferrous sulfate | فێرۆز سولفەیت ، زاجی سەوز. |
| كبريتات الخارصين - زاج ابيض | White Vitriol = | گۆگرداتی زینک. |
| كبريتات المغنيسيوم | Magnesium sulphate = psomsalt | مەگنیسیۆم سولفەیت، خوێی ئیپسیۆم. |
| كبريتات الكالسيوم - جبس | Calcium sulfate = gypsum ($CaSO_4 . 2H_2O$) | گۆگرداتی کالسیۆم - گەچ - ئەگەر بێ ئاو بێت به شێوەی بلووری یان تۆزی سپی هەیە ، لە دروست کردنی چیمەنتۆی پۆرتلاندو خشت و پلاستەرو تۆزی ساف کردن و بۆیەو کاغەزو کانزا کردن و دروست کردنی قاڵب و لەوحی دیوار داپۆشین. |
| كبريتات الكروم | Chromium -sulfate | گۆگرداتی کرۆم ، به شێوەی تۆزێکی سور یان بنەوشەیی هەیە، لە دروست کردنی قوماش و بۆیەو وەرنیش و.مەرەکەبی سەوزو سیرامیك دا بەکاردێت، یاسای کیمیایی$Sr_2(SO_4)3 . 15H_2O$ . |

| | | |
|---|---|---|
| كبريتات الكادميوم | Cadmium -sulfate ($Cd SO_4 . 4H_2O$) | گۆگرداتی کادمیوم ، بە شێوەی بلووری بێ ڕەنگ بێ بۆن هەیە، لە دروستکردنی بۆیەو لە مەیانی پزیشکێتیو لە پەردەی فلۆریسینیدا بەکاردێت. |
| كبريتات النيكوتين | Nicotine -sulfate | گۆگرداتی نیکۆتین، دەرمانێکە بۆ قەلاچۆکردنی مێشو مەگەز. |
| كبريتيد | Sulphide = sulfide | گۆگردید ، خوێی ترشی هایدرۆگۆگردیك ڕەنگێکی کیمیایی یە هاوهێزیەکەی (٢) ە. |
| كبريتيد - ركاز | Blende | بلێند گۆگردید - کەرەسەیەکی خاوی زینک ، وەکو گۆگردیدی زینک. |
| كبريتيد الزنك | Zinc- blende | گۆگردیدی زینك. |
| كبريتيد البزموث | Bismuth sulfide | گۆگردیدی بزمۆث ، تۆزێکی مەیلەورەشە لە ئامادەکردنی ئاوێتەکانی تری بزمۆ ثدا بەکاردێت ، یاسای کیمیای - $Bi_2 S_3$ . |
| كبريتيت البيوتيل | | گۆگردیدی بیوتیل لە شل کردنەوەی (مڵ کردنی) لاستیکدا بەکاردێت. |
| كبريتيدد الهيدروجين | Hydrogen -sulfide | گۆگردیدی هایدرۆجین ، گازێکی بۆگەنە. |
| كبيرتيد الأمونيوم | $((NH_4)_2 S$ | گۆگردیدی ئەمۆنیۆم، بە شێوەیەکی بلوری بێ ڕەنگ یان زەرد هەیە، لە دروست کردنی دەرمان و وێنەگرتنی فۆتۆگرافیدا بەکاردێت، هەروەها لە ڕەنگ کردنی برۆنزدا. |
| كبريتيد الألمنيوم | Aluminium sulphide | گۆگردیدی ئەلەمنیۆم ، بە شێوەی تۆپەڵی خۆڵەمێشی مەیلەو زەرد هەیە، بۆنێکی ناخۆشی هەیە، لە دروست کردنی گازی گۆگردیدی هایدرۆجیندا بەکار دێت، یاسای کیمیای $AL_2S_3$ |
| كبريتيد الاليل | Allyl sulphide | گۆگردیدی ئەلیل ، شلەیەکی بێ ڕەنگە بۆنی سیری لێ دێت، لە دروستکردنی ڕۆنی سیردا بەکاردێت. |
| كبريتيد الباريوم | Barium sulfide (Bas) | گۆگردیدی باریوم، بە شێوەی تۆزی یان (تۆپەڵی) سەوزی مەیلەو زەرد ، یان خۆڵەمێشی هەیە ، لە لابردنی توك لە پێستەو ئامرازی دژی سوتان و ئامادەکردنی خوێیەکانی باریۆمدا بەکاردێت. |
| كبريتيت البنزيل | | گۆگردیدی بەنزیل ، بە شێوەی توێژاڵی بێ ڕەنگ هەیە، لە دروستکردنی مادە ئەندامی یەکاندا بەکاردێت. یاسای کیمیای $(CH_2 C_6H_5)_2S$ . |
| كبريتيد السيرك - كبريتيد السيريوم | Ce sulfide | گۆگردیدی سیریوم ، مادەیەکی کیمیایی یە |
| كبريتيد الكاربون - ثاني كبريتيد الكاربون | | کاربۆن دای سەلفاید ، دووەم گۆگردیدی کاربۆن، شلەیەکی بۆگەنی بێ ڕەنگە، بۆ لەناوبردنی مێرووەکان بەکاردێت. |
| كبريتيد الحديد - بيريت | Pyrites = iron pyrites = | پایرایت، $FeS_2$ دووەم گۆگردیدی ئاسن، ئاوێتەیەکە ڕەنگێکی برۆنزی مەیلەو زەردی هەیە، لە دروستکردنی گۆگردو ئاوێتەکانیدا بەکاردێت. |
| كبريتيد الزرنيخيك - زرنيخ ياقوتي - زجاج زرنيخي احمر - زرنيخ احمر | Arsenic sulfide = arsenic- disulfide | گۆگردیدی زەرنیقیك ، تۆزێکی سووری مەیلەو پرتەقاڵی یە، ژەهرینە، بە خواردن و هەڵمژین، لە پیشەسازی پێستەو دەرمانی توك لابردن و بۆیەدا بەکاردێت، یاسای کیمیای . $AS_2 S_2 = AsS$ . |
| كبرتيد الانتيمونوز- كبريتيد الأنتيمون - انتمون برتقالي - انتمون اسود | Antimonous -sulfide = antimony- sulfide = antimonyorang trisulphide | گۆگردیدی ئەنتیمۆنۆز = ئەنتیمۆنی پرتەقاڵی ، ئەنتیمۆنی ڕەش، بە شێوەی بلووری ڕەش یان پرتەقاڵی هەیە، لە دروستکردنی ژەنگبەر(زنجفر) و یان بۆیەی زەردو شقارتەدا بەکاردێت. |
| كبريتيد الكادميوم = كادميوم برتقالي | Carbonyl sulfide (CdS) | گۆگردیدی کادمیوم ، بە شێوەی تۆزێکی زەرد یان قاوەیی هەیە، لە دروستکردنی بۆیەو مەرمەکەبو سیرامیك و پەردەی فلۆریسێنتدا بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| كبريتيد الكاربونيل | Carboni sulfide (CoS) | گۆگردیدی کاربۆنیل، گازێکی بێ ڕەنگی ژەهرینە زوو گڕ دەگرێت، لە دروستکردنی ئاوێتە ئەندامیەکاندا بەکاردێت. |
| كبريتيد الكالسيوم | Calcium sulfide (CaS) | گۆگردیدی کالسیۆم ، تۆزێکی کەمێك خۆڵەمێشی یان زەردە، ئەگەر بەر شێ بکەوێت بۆنی گۆگردیدی هایدرۆجینی لێ دێت، تامێکی ناخۆشی هەیە، کەمێك لە ئاودا دەتوێتەوەو شی دەبێتەوە لە دروستکردنی بۆیەو دەرمانی تووك لابەر ، لە دەرمانی بەیتالیدا بەکاردێت. |
| كبريتيت | Sulfite = Sulphite | گۆگردیت، ڕەگی ترشی سەلفۆرۆز گۆگردۆز ڕەگێکی کیمیاییە هاوهێزیەکەی (٢) ە. |
| كبريتيت الباريوم | Barium sulfite | گۆگردیتی باریۆم، تۆزێکی سپیە بە گەرم کردن شی دەبێتەوە، لە کرداری شیکردنەوەی کیمیایی و دروست کردنی کاغەزدا بەکر دێت، یاسای کیمیای $BaSO_3$ |
| كبريتيت البوتاسيوم | Potassium sulfite | گۆگردیتی پۆتاسیۆم. |
| كبريتيت حامضية | Bisulfite | بای سولفیت، خوێی ترشی گۆگردۆز هایدرۆجینی تیایە. |
| كبريتيت الكالسيوم | Calcium sulfite $[(CaSO_3)\ 2H_2O]$ | گۆگردیتی کالسیۆم، تۆزێکی سپیە ، کەمێك لە ئاودا دەتوێتەوە، لە دروستکردنی قوماشدا ، بۆ ڕەنگ لابردن و میکرۆب کوشتن، (لە دروستکردنی شەکردا) و بۆ پاراستنی خواردەمەنی و لە دروستکردنی کاغەزدا بەکاردێت. |
| كبريتيت الكالسيوم الهيدروجينية - كبريتيت الكالسيوم الحامضية | Calcium - hedrogen sulfite $(Ca(HSO_3)_2)$ | گۆگۆدیتی کالسیۆمی هایدرۆجینی گۆگردیتی کالسیۆمی ترشی - شلەیەکی مەیلەو زەردە، بۆنێکی تیژی هەیە لە ئەنجامی لێ دەرچوونی دووەم ئۆکسیدی گۆگردەوە ، بۆ لابردنی کلۆر لە قوماش لە ئامادەکردنی هەویری کاغەزداو لابردنی ڕەنگی ئیسفەنج و لە دەرمانی کوشتنی میکرۆبدا بەکاردێت. |
| كبريتة - شخاطة | Match | شقارتە. |
| كبريلة | Cabriolet | کەبریلە ، عەرەبانەیەکە (گالیسکە) سوکەڵەیەو دوو پێچکەی هەیە ، ئەسپێك ڕایدەکێشێت ، جێی دوو زەلامی لەسەر دەبێتەوە. |
| كبري - كوبري - جسر | Bridge | پرد. |
| كبس - ضغط | Pressure | پەستاندنەوە، پەستاوتن، پەستان، فشار. |
| كبسولة متفجرات - كبسولة اشعال | Detonator = priming cap = igniting primer | تەرەقە ، ساچمە ، قاوغێکی کانزای مەیلەو خڕە ، بە مادەی تەقەمەنی ئاخنراوە، بە پاڵەپەستۆ دەتەقێ. دەکرێتە ناو تفەنگی ڕاوەوە. |
| كبسولة فضائية | Space cabin | کابینەی بۆشایی ، ژوورێکە لە گالیسکەی بۆشاییدا ، واتە لەو مانگی دەستکردەدا کە بۆ هاتوچۆی مرۆڤ ئامادەکراوە گەلێك ئامرازی گرنگی تێدایە. |
| كبسولة دواء | Capsule | گولاج ، قاوغێکە لە جەلاتین دەرمانی تێ دەکرێت بۆ ئەوەی بە ئاسانی قوت بدرێت. |
| كبش | Ram = tup= Ovis = male sheep = ewe | بەران ، وەران ، نێری مەڕ ، قۆچ. |
| كبش الجبل = اروية - كبش كبير القرن. | Big horn = moufion | بەرانە کێوی ، مەڕە کێوی ، کەڵەکێوی، جۆرێکە لەمەڕ، شاخەکانی گەورەن لە چیاکانی کوردستاندا دەژی پێی دەوترێ (لۆرستانی). |
| كبش القرنفول | Cloves | گوڵە مێخەکی ووشك کراوە، تامەکەی تونە، بۆنەکەی خۆشە، ڕۆنێکی لێ دەردەهێنرێ بۆ مەبەستی پزیشکی دژی ڕشانەوەوکۆڵنج و هێمن کردنەوە بەکاردێت هەروەها دەکرێت بە مێخەك بەند. |

| | | |
|---|---|---|
| كبشة - مل اليد | Hand ful | چنگێك ، مشتێك ، لالوێچێك |
| كبشة = مخرفة | Ladle = scoop | چەمچە ، بۆ گواستنەوەی شلە. |
| الثيات | Hook and eye | قرتێنە : بۆ بەستنی دوو پارچە قوماش بەیەکەوە. |
| كبش ميرينو | Merino | (مێرینۆ) مەڕێکی ئیسپانییە، خورییەکەی نایابە. |
| كبع، جمل البحر | Megaptera = Humpback whale | بالین ، وشتری دەریا، جـۆرە نەهـەنگێکی گەورەیـە، پەرەکەیـەك وا بـە پشتییەوە لە دوگ دەچێت، وەکو پشتی کۆم بێت وایە. |
| كبك | Kapock | کاپۆك، تۆپەڵە ریشاڵی ئاوریشمی لە تۆوی درەختی سیبا (Ciba) دا هەیە بە شێوەی ناواخن دەکرێتە دۆشەك و سەرین و گۆشەوە. |
| كبل - قابلو | Cable | کێبل ، کلافە تەلێکی مسە، بە مادەیەکی دابڕکەری وەکو لاستیکی ئەستور بۆ مەبەستی گەیاندنی کارەبا بەکاردێ. |
| كبل -قيد | Hand cuffs = manacles | کەلەپچە - بۆ دەست بەستنی تاوانبار. |
| كبلين | Capelin | کاپیلین ، ماسی‌یەکی بچوکە. |
| كبوة = عثرة | Stumbling = misstep | سەرسم، رەت بردن، نوچ بردن، پێ هەڵنوتان، نوچ، پێ هەڵکەوتن، هلنگفتن. |
| كبوت | Chabot = chabotage | نەخۆشی‌یەکی میکرۆبییە دەدات لەدار مێو. |
| كبوت - معطف | Overcoat | قاپوت، پاڵتۆ. |
| كبوتل | Copris lunaris | جۆرە قالۆنچەیەکی رەشە. |
| كبود انگليزی | Fresh leather | فرێش لەزەر، بۆرییە لاستیکێکی زۆر تەنکە دەکرێ بە چووکا لە کاتی جووتکردندا بۆ نەهێشتنی سك پڕبوونی ئافرەت. |
| كبوريا - سلطعون | Carb | قرژاڵ |
| كبوس | Productive | درەختێك کە بەری زۆر بێت. |
| كبوسين = سلبية = ابو خنجر - طرطور الباشا | Capucine = tropaeolum | گیاکە گەڵاو گوڵـەکەی دەخورێت گەڵاکەی لـەزێ دەچێت و گوڵەکـەی لـە خوێنە. |
| كبوشة | Capuche | کاپووشی، کڵاوی برنوسی ، کڵاوی برنووسی گەرماو. |
| كبوشي - قرد مقلنس | Capuchin | کـاپوچیت، مـەیمونی کـڵاودار، مەیمونێکـە لـە باشـوری ئـەمریکادا دەژی سەرەکەی تووکی رەشی پێوەیە، لە شێوەی کڵاودا. |
| كبي | Tarnish | رەش بـوون، وەکـو رەش بونـی کـەوچکی زیـوو بـە کـاری گۆگردیـدی هایدرۆجین ئەگەر هێلکەی پێ بخورێت. |
| كبيبة | Glomerule = Glomerulus | کلافۆکە ، گلۆلۆکە، گۆمەڵەیەکە لە دەزولەی خوێن لەناو تورەکەی بۆمان لە گورچیلەدا. |
| كبيبة - كبة | Copalba | کۆپیبـا، کەبیبـە ، جـۆرە رومەکێکـە بەرەکـەی بـە شـێوەی بـەهارات بـەکار دەهێنرێت، جۆرێکە لە بەهارات. |
| كبيبة | Copayta | درەختێکـە لـە ئەمـەریکاو ئەفـەریقای ئیسـتیوائیدا دەروێـت، درەختێکـی گەورەیە، تەختەکەی سوورە، لە دروستکردنی بینادا بەکاردێت، قەدەکەی دەقلیشێنرێت ئاوگێکی رێسینی لێ دەردەهێنرێت. |
| كبيت ، لخ | Loch | ماسی‌یەکی رووبارییە. |
| كبة ، كبيبة | | کۆپاپبا ، درەختێکی گەورەیە گەڵاکەی ئاوێتەیـە ، گوڵەکـەی بـە شـێوەی هێشووە بەرەکەی لە بەری پاقلە دەچێت، یەك دەنکی تیایە، تەختەکـەی قاوەیی‌یـە، بـە نرخـە، زەمقێکـی رێسـینی لـە قەدەکـەی دەردەهێنـرێت بـۆ مەبەستی پزیشکی. |

| | | |
|---|---|---|
| كبة | Kepi | كێپی ، كڵاوی سەربازی فەرەنسی. |
| كبيد | Big bitter orange | جۆرە نارنجێكی گەورەیە ، ڕۆنی توێكڵەكەی بۆ دەرمان بەكار دەهێنرێ. |
| كبير | large = big = gross | گەورە ، زل ، زۆپ ، درشت |
| كبير الرأس = قندل = أرأس | Megalocepha-lous = macrocephalous | سەرزل ، گیانداری سەرزل. |
| كبير العنق | | مل ئەستور ، مل قەوی ، ملهوڕ. |
| كبير البطن | | گەدن، هورگن، ورگ زل |
| كبير السن | Old | پیر ، بە تەمەن. |
| كبير الكفل | Steatopygous | سمت گەورە. |
| كبير القدم | Macropodus | پێ زل ، كەسێك پێی زل بێت. |
| كبير الأجنحة | Macorpterous | باڵ گەورە، وەكو لە باڵندەدا. |
| كبير الورق | Macorp phyllous | گەڵا گەورە ، هەر ڕووەكێك گەڵاكەی گەورە بێت. |
| كبير الثمر | Macorcarpus | بەر گەورە، ڕووەكێك بەرەكەی گەورە بێت. |
| كبيس = مكبوس | Pickled = preser vedin pickle | هەر شتێك لە سركە یان لە خوێدا پارێزراو بێت وەكوو ترشیات. |
| كبسة = سنة كبيسة | Leap year | ساڵی پڕ ، ساڵێكی خۆرییە ، مانگی شوبات تیایا (٢٩) ڕۆژە ، لە هەر چوار ساڵدا جارێك . |
| كبيكج = كف السبع | Asiatic crow foot | لەپی شێر ، گوڵاڵە سورەی ئاسایی |
| كتاب = سفر | Book | پەرتوك ؛ پەڕاو ، كتێب. |
| كتاب الأنساب | Herd book = stud book | كتێبی ڕەچەڵەك ، كتێبێكە ڕەچەڵەكی وڵاخ و مانگای تیا دەنوسرێت. |
| كتاب الوصفات الطبية | Formulart | كتێبی ڕەچەتەی پزیشكی |
| كتابة | Writing | نوسین. |
| كتابة باليد = مخطوطة | Manuscript | دەست نوس، دەست خەت. |
| كتابة جلدية | Dermatography | |
| كتابرسين | Kutapressin | (كەتاپریسین) دەرمانێكە بۆ چارەكردنی نەخۆشی پێست وەكو ئەكزیماو عازەبە،بە شێوەی دەرزی هەیە. |
| كثاة | | راجع كلمة كثاة، جرجير) |
| كتارت، اظلام العدسة الماء الأبيض = السد | Cataract | كاتاراكت، ناوی سپی ئێڵ بوونی زەرەبینی چاو بە تایبەتی لە مرۆڤی بە تەمەندا. |
| كتافية | | شان گر ، شان ، بەند ، قەنەواچە. |
| كتالبسيا = جمدة = آخذة | Catalepsy | (كاتالیپسی) نۆرەیەكی دەرونییە تیایدا، لەشی نەخۆشەكەو پەلەكانی رەق دەبن و هەستایەتی (حساسیە) وون دەبێت و ، لەشی سارد دەبێتەوەو هەناسەی هێواش دەبێتەوەو قسەی بۆ ناكرێت. |
| كتالوك | Catalog = catalogue | رابەر ، كەتەلۆك ، باو ، مۆدێل ، لیستە = پێرست. |
| كتامة = كتومية = لانفاذية | Impermeability | ناگوزەری ، ڕەوشتی نەهێشتنی پیا گوزەركردنی ئاو بە هەندێك مادە وەكو لە هەندێك كەڤردا. |
| كتان (قماش) | Linen | قوماشی كەتان. |

| | | |
|---|---|---|
| كتان ملسج | Lin seed = flax | كەتان ، روەكێكی جوانە ، قەدەكەی درێـژو راستە ، گوڵەكەی شینە، ریشاڵی لێ دەردەهێنرێ ، بۆ دروست كردنی قوماش، هەروەها دەنكەكەی رۆنی لێ دەردەهێنرێ. |
| كتان احمر | Scarletflax | كەتانی سور. |
| كتان المناقع | Coltongrass | لۆكەی زۆنگاو - رووەكێكە سەرگوڵەكەی لە هی لۆكە دەچێت. |
| كتان مسهل | Purging flax = fairy flax = cathartic flax | جۆرێكە لە كەتانە كێویلە ، گیایەكە گوڵەكەی گەورەو زەردە، بۆ مەبەستی پزیشكی بۆ رەوان كردن بەكاردێت. |
| كتاني | Linen | كەتانی = شتێك لە قوماشی كەتان دروست كرابێت. |
| كتانية - ليناريه | Linaria | (ليناريا) جۆرە رووەكێكە گەڵاكەی لە گەڵای كەتان دەچێت گوڵەكەی بە شێوەی هێشویەكی زەردە، بۆ مەبەستی رازاندنەوەی باخچەكان بەكاردێت. |
| كتبي | Book seller | پەرتوك فرۆش ، كتێب فرۆش |
| كتبخانة - مكتبة = محل بيع الكتب | Book store = book shop | كتێبخانە - شوێنی فرۆشتنی كتێب. |
| كتب الأنساب | Geneal ogical books | ئەو تۆمارانەی كە ناو و شێوەو سیفەتی گیانداره ماڵییەكان خۆیانو باوكو دایكیانی (واتا رەچەڵەكی) تیایدا تۆمار دەكرێت. |
| كتبرد | Cat bird | كاتبێرد ، باڵندەیەكی ئەمەریكی خۆش ئاوازە. |
| كتبوت | Cat boot | كاتبۆت، كەشتییەكی چارۆكەدارە ، یەك تێڵای هەیە لە بەردەمەكەیدا. |
| كتر- سنط عسلي - ضبة - سمر | Acacia - mellifera | ئەقاقیای هەنگوینی |
| كتريش - جميل الشعر | Water star -wort | گیاكە لە ئاوی شیریندا دەروێت، ئاوێكی لینجی لێ دەردەهێنرێت بۆ قژ نەرم كردن. |
| كتزل | Quetzal | (كویتزال) باڵندەیەكە لە ئەمەریكای ناوەڕاست دەژی. |
| كتشينة - ورق القمار | Playing Cards | كاغەزی قومار. |
| كتش | Keteh | كێچ، جۆرێكە لە كەشتی چارۆكەدار دوو تێڵای هەیە. |
| كتف - عاتق - منكب | Shoulder = scapula | شان ، ئێسقانی راستو چەپی خوار مل كە هەردوو قۆڵی لێوە دەرچووە. |
| كتفي | Scapular | شانی ، هەرشتێك پەیوەندی بە شانەوە هەبێت. |
| كتف وعضد | | شانو باهۆ. |
| كتكوت - قوت - صوص - فروج | Chicken = chick = nest ling | جوجەڵە ، جوجك ، فرووخ. |
| كتل | Lump | كلۆ، پارچە. |
| كتلبة | Catalpa | (كاتالپا) درەختێكی جوانە گەڵاكەی سپییە، هێڵی رەنگاورەنگی تیایە لە شێوەی دڵدایە لە زەنگوڵە دەچێت، بەرەكەی لە خەیار دەچێت ، بۆ مەبەستی رازاندنەوەی باخچەكان دەروێنرێت. |
| كتلة - كدسة - لزنة | Clum = block | تۆپەڵ - كلۆ = ئەنگوتك. |
| كتلة | Mass | بارست، بارستایی، بڕی مادە لە قەبارەیەكی تایبەتیدا |
| كتلة ترابية | | كەرسەك كلەتك، تۆپلاخ ، تۆپەڵەگل. |
| كتلة حرجة | Critical mass | بارستەی شلۆق- بچووكترین بڕ لە مادەیەكی شیاو بۆ لەت بوون (انشطار) كە كارلێكی زنجیرەیی پەیدا بكات، بەبێ پێویستی سەرچاوەیەكی دەرەكی لە نیوترۆن. |
| كتلة ذرية | Atomic mass | بارستەی ئەتۆمی (گەردیلەیی) |

| | | |
|---|---|---|
| كتلة فوهية = لاكوليت) | Laccolith | (لاكۆلیث) = تۆپەلیکی شیوە گومەزییە لە بەردی ئاگرین کەوتۆتە نیوان چینەکانی گەڤرە نیشتەنیەکانی ناو زەوییەوە. |
| كتلة مقحمة = لاكوليت | Laccolith | لاكۆلیث تۆپەلیکە لە کەڤری ئاگرین. |
| كتلة مخروطية من السكر | Coneshaped -sugar | کەللەی شەکر ، قەند. |
| كتلة هوائية | | تۆپەلە هەوا ، کۆمەلە هەوا، پەلەبا فرمانگەی کەشەوانی (کەشناسی) دەتوانیت بە هۆیەوە باری کەش بزانیت. |
| كتم = كتمان | Hiding = concealing | شاردنەوە ، پیش خواردنەوە. |
| كتم النفس | Smothering | ددان بەخۆ داگرتن = نهینی گریی. |
| كتم ، كتمان، قتم، مرسين | Myrsine | مایرسین - رووەکیکی شاخییە، گەلاکەی لە گەلای مۆرد دەچیت ، قژی پێ رەنگ دەکریت ، هەروەها مرەکەبی لێ دروست دەکریت، بەرەکەی لە بەری بیبەری رەش دەچیت، کە پێ گەیشت رەش دەبیت، جۆرە رۆنیکی لێ دەردەهینریت. |
| كتن | Tubercularia | (تیوبەرکولاریا) کە رووەکی زیانبەخشە دەدات لە میوەجاتی وەکو هەلوژەو سیو |
| كتنة ، كوپاليه | Gumcopal tree = copal tree | درەختی کۆپال - درەختیکە تەختەکەی سوورو رەقو بە نرخە ئاویکی زەمقی ریسینی بە نرخ لە قەدەکەی دەردەهینریت.پێی دەوتریت (کۆپال) لە دروست کردنی وەرنیشدا بەکادیت. |
| كتوم - كتيم | Impermeable | ئەو زەوییەی کە ئاو دەگریتە خۆی واتە ئاو گل دەداتەوە. |
| كتيب | Booklet | نامیلەکە، کتیبی بچووك. |
| كتيبة | Cohort | کەتیبە. |
| كتيبة (عسكرية) - فوج | Battalion = regiment | بەتالیون - بەشیکە لە لەشکری سەربازی. |
| كتيم - طبقة قشرية صلدة - صمان | Hardpan | چینە خاکیکی پتەو. |
| كتيم - طبقة طاردة للماء | Aquifuge | چینیکی ئاو نەدز. |
| كتيم الهواء - محكم | Hermetic = airtight | بن بر لە هەوا - هەوا نەدز ، شوینیکی مەحکەم کە هەوای تێ نەچیت. |
| كتينة | Catena | زنجیر |
| كتينة الساعة - سلسلة الساعة | Watch chain | زنجیری سەعات |
| كثاء | | گیاکە گولی جوان دەگریت. |
| كثاة ، جرجير - ركة | Rocket | گۆزەلە ، گیایەکە گولەکەی زەردە گەلاکەی دەکریت بە زەلاتە. |
| كثاة | | (راجع كلمة قشرة) |
| كثافة | Density | خەستی ، چری ، رچی ، ریژەی نیوان بارستایی و قەبارەی مادەیەك کیشی ١ سم٣ لە مادەیەك بە گرام. |
| كثافة مطلقة | Absolute density | چری روت ، چری بەرەلا، خەستی پەتی. |
| كثافة بخارية | Vapor density | چری هەلمی ، خەستی هەلمی ، ژمارەیەکە بریتییە لە کیشی قەبارەیەکی زانراو لە گازیك یان هەلمیك بۆ کیشی قەبارەکەی یەکسان لە هایدرۆجین. |
| كثافة الاجفان - لخص | Blepharo -pachynsis | پیلوو ئەستووریی - ئاوسانی پیلوو. |
| كثافة نسبية | Relative -density | خەستی رادەیی ، چری رادەیی. |
| كثافة التلوث | Density of contamination | خەستی پیسی وەکو رادەی پیس بوون لە هەوادا. |
| كثافة الدم | Pelohemia | خەستی خوین. |
| كثافة كتلية | Mass density | خەستی بارستەیی. |

| | | |
|---|---|---|
| كثافة القرنية - ليوكوما | Leucoma | ليوكوما - خەست بوونەوەی کۆرنیای چاو. |
| كث | To be thick (or) dense | سفت ، تامۆر ، پڕ ، چڕ. |
| كث الشعر | Hairiness | تووکن ، تیسکن. |
| كث اللحية | | بەلەمەریش. |
| كثرة الأصابع | Hyperdacty lia | پەنجەزۆری. |
| كثرة الكريات البيض - كثرة الكريضات | Leukocyto sis | زۆری خۆرکە سپی‌یەکان لە خوێندا. |
| كثرة الاثداء | Hyper thelia = Polymstia | مەمك زۆریی. |
| كثرة البول | Pollakiuria | میز زۆری - زۆری میز. |
| كثرة التعطش | Pollakidipsia | تینوێتی زۆر - زۆر تینو بوون. |
| كثرة التكلم | Polylogia | زۆر قسەکردن - چەنەباز. |
| كثرة العرق | Polyhidrosis | زۆریی ئارەق - ئارەق زۆریی. |
| كثرة اللعاب | Ptyalism | لیك زۆریی - زۆریی لیك. |
| كثرة المني | Poly spermism | زۆریی سپێرم (لە ئاوی پیاودا). |
| كثرة اللمفيات = كثرة الكريفاوات | Lymphocy tosis = Lymphocy themia | زۆری خرۆکە لیمفاوی‌یەکان لە خوێندا. |
| كثرة البول | Diabetes | زۆر میزکردن ، وەکو لە نەخۆشی شەکرەدا. |
| كثعم | Leopard | پڵنگ.پڵنگی رەش. |
| كثلة | Apple | بەری دارسێو. |
| كثـير - وافـر كثير | Many = much = plentiful = poly- | پێشگرێکە بە مانای زۆر ، گەلێك ، فرە. |
| كثير الشجر | Arboreous | زۆر درەخت - جەنگەڵ ، ناوچەیەك درەختی زۆر بێت. |
| كثير الزهر | Multiforous | زۆر گوڵ - رووەکێك گوڵی زۆر بێت. |
| كثير الثمر - مثمر | Fructuous | زۆربەر، فرەبەر، رووەکێك بەری زۆر بگرێت. |
| كثـير الأرجـل- كثير الأقدام | Millepede = lyriapoda = polypod | فرەپێ، گیاندارێك کە پێی زۆر بێت وەکوو لە جومگەدارەکاندا. |
| كثير النوى | Coenlcyte | زۆر ناوك - خانەیەکی رووەکی کە ناوکی زۆر تیادا بێت وەکو لەهەندێك قارچکدا. |
| كثير اللغات | Poly glot | چەندینە زمان ، کەسێك بە چەند زمانێك بنووسێت یا قسە بکات. |
| كثير الأسنان | Poly odont | ددان زۆر. |
| كثير الذرات | Polyatomic | ئەتۆم زۆر، گەردیلە زۆر. |
| كثير القيم | Poly valent | بەها زۆر. |
| كثير القوائم - كثير الأرجل | My riapoda | پەل زۆر - گیاندارێك پەلی زۆربێت وەکو (هەزار پێ). |
| كثير النوى | Polynuclear | ناوك زۆر - بەرێك ناوکی زۆ تیابێت. |
| كثيرة الأزواج - كثيرة البعول - متعددة الأزواج. | Poly androus | مێرد زۆر - ژنێك چەند مێردێکی هەبێ لە هەمان کاتدا. |

| | | |
|---|---|---|
| كثير البكاء - بكاء | Weepy = lachry mose | گرینۆك ، كەسێك زۆر بگری |
| كثيف | Dense = thick | خەست ، چڕ. |
| كثيب رملي = كثبان رملية | Dune = sand hill | تەپۆلكەی مل ، گردەبا ، گەردەبا، بارخان، تەپۆلكەیەكە بەكاری با لە بیابانەكاندا پەیدا دەبێت. |
| كثيب جليدي | Drumlin | تەپۆلكەی سەهۆڵی - تەپۆلكە سەهۆڵ. |
| كثيراء - قرينة - عنزروت = قتاد الضمغ = صمغ الطرغاكنث - شجر القتاد - كفيعة - قريجة - شرشير - اصابع العروس - مشلة البقر - اظافر الجن - اظافر الشيطان | Astragalus = tragacanth = goats thorn | كەتیرە ، گەوون ، شو ، خووژە ، جونی ، جوێنی ، جەباری ، تویسو ، تویسی ، گوێنی ، گوونی ، گونجلیل ، گیاپیندا ، كەروێشكی ، چەقچەق ، دارمكیجە، تۆلتاق، (لە كفری) ، تاقالق ، تاقتاقی ، تابلەكونی ، هەنگوشیر (لە دهۆك) ، مێژورد (لە قەرەداغ) ، مێژمێژۆك دۆكۆلیشكا (لە پیرەمەگرون)، دوقلە جاشا ،(لە زێوێ). |
| كحة - سعال | Cough | كۆكین ، كۆخین ، كۆكە. |
| كحال - طبيب العيون | Oculist | پزیشكی چاو. |
| كحالة - طب العيون | Oculistics | پزیشكێتی چاو. |
| كحب - بروق - حصرم | Riasin vert = green sour grapes | بەرسیلە ، بێسیرە. |
| كحت - جرف - كشط | Curettage = apoxesis = scraping off | كراندن، داتاشین ، رنین ، رامالّین ، لورتا ، كورتاج ، كراندنی منالّدانی ئافرەت. |
| كحكحة | Hacking cough | كۆكەكۆك كۆكەی پچڕ پچڕ. |
| كحل | Eye powder = Kohl = black or painted black (eye) | كل ، سورمە ، بۆرەش كردنی پێلّووی چاو |
| كحلي | Navy blue | كلی - شینی تۆخ یان تێر. |
| كحللة | Alcholysis | ئەلكهولاندن : ئەوەیە كە ئەلكهول بكرێتە ئاوێتەیەكەوە. |
| كحلاء - قرقفنة | Garden walber | جۆرە بالّندەیەكە. |
| كحلاء - كحيلا - لسان الثور | Barage-anchusa | زمانەگا ، گیایەكی پزیشكی‌یە. |
| كحلاء - كحيلاء = شنجار صباغي | Dye | بنەگۆزروان ، جۆرێكە لە گۆزروان، رووەكێكی دەشتەكی و كشتوكالّی‌یە ، رەگەكەی قاوەیی‌یە، گولّەكەی بۆن خۆشە، رەنگەكەی سپی مەیلەو زەردە، رەنگێكی سوری بە نرخ لە رەگەكەی دەردەهێنرێت. |
| كحلاء - كحيلا - شنجار - حميرا - حنا الغولة = رجل الحمام - حالوما = خسّن الحمار - شجرة الدم | Alkana tincloria | پێ كۆترە ، گیایەكە بۆیەیەكی سوور لە رەگەكەی دەردەهێنرێت. |
| كحلة - اذريون البر | | راجع قوقحان. |
| كحول - الكحول | Alcohol | ئەلكول ، ئەلكهول ، شلەیەكی هەلّچوە ئاوێتەیەكی ئەندامی‌یە، كۆمەلّێك یان زیاتر لە هایدرۆكسیل و كۆمەلّێك یان زیاتر لە كۆمەلّەی هایدرۆكاربۆنی تیایە. |
| كحو اميلي | Amyl alcohol | ئەلكهولی ئەمیلی : لە پەتاتەو چەوەندەرو دانەوێلّە دروست دەكرێت. |
| كحول اثيلي | Ethyl alcohol | ئەلكولی ئەسیلی، ئیسانۆل ، ئیثانول ئاوێتەیەكە لە كاربۆن و هێدرۆجین و ئۆكسجین، شلەیەكی بێ رەنگە، بۆنێكی تیژی هەیە، لە دلّۆپاندنی سركەی گەراوە دەردەهێنرێ بۆ دروست كردنی مەی و بۆنی خۆش و رەنگ بەكار دەهێنرێ. |

| | | |
|---|---|---|
| كحولاز | Alcoholas | ئەلكهولاز - هەوێنێكە جۆرەكانی شەكر دەگۆڕێت بۆ ئەلكهول و گازی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن. |
| كحولات - الكحولات | Alcoholate | ئەلكهولات : ئاوێتەیەكە كانزایەك جێگەی گەردیلەیەكی هایدرۆجینی گرتۆتەوە لە كۆمەڵەی هایدرۆكسیلەكەدا. |
| كحول احادي | Mono hy dric alcohol | ئەلكهولی تاكی : ئەو ئەلكهولەی كە هەر گەردێكی یەك كۆمەڵە هایدرۆكسیلی تیادایە. |
| كحول السيريل | Ceryi alcohol | ئەلكهولێكی تێرە لە مۆمدا هەیە. |
| الكحول المعدوم - الكحول المعطل | Denatured alcohol | ئەلكهولی پەك خراو، بریتی‌یە لە ئەلكهولی ئەسیلی ، بەڵام كەمێك سپرتۆ (ژەهر)ی تێ كراوە بۆ ئەوەی بەكار نەهێنرێ لە دروست كردنی مەی‌دا. |
| كحولية حادة - سكر | Acute alcoholism | سەرخۆشی - بەدمەستی |
| كحول مثمل | Methylated spirit | كحولی مە ثیلاوی ، كحولێكە میثانۆلی تێكراوە بۆ گەرم كردنەوە وە رووناك كردنەوە بەكاردێت. |
| كحـــول مطلـــق- الكحول المطلق | Absolute alcohol | ئەلكولی روت، ئەلكولی پەتی. |
| كحـــول مثيلـــي - كحـــول الخشب - ميثانول - سبرتو | Methyl alcohol = Wood -alcohol | میسانۆل ، سپرتۆ ، ئاوێتەیەكە لە كاربۆن و هێدرۆجین و ئۆكسجین، شلەیەكی بێ رەنگەو بۆنێكی تایبەتی هەیە، ژەهرە ، دەبێتە هۆی كوێربوون و مردن، بۆ دروست كردنی بۆیەو سوتەمەنی و دەرمان بەكار دەهێنرێ، ئەلكهولی مەسیلی ئەلكولی تەختە. |
| كحولي | Alcoholic = spirituous | ئەلكهولی - هەرشتێك پەیوەندی بە ئەلكهولەوە هەبێت. |
| كحولية | Alcoholism | ئەلكهولێتی = خووگرتن بە ئەلكهول (مەی) خواردنەوە. |
| كحيلة | | گیاكە بۆ دەباخ كردن بەكار دەهێنرێت. |
| كحيل (فرس) - فرس نجيب | Apedigree horse | ئەسپی كەحێلە، ئەسپی رەسەن. |
| كد | Toil = labour | رەنج |
| كراد - كثيراء | Tragacanth | كەتیرە ، گەوون. |
| كداس | Sneezing | پژمینی چوارپێ. |
| كدان - حجر سلس | Freestone | بەردێك بە ئاسانی ببڕێتەوە. |
| كدح | Drugery = exertion | رەنج كێشان ، ئەرك كێشان |
| كدر - عاكر | Troubled | لێڵ ، لیخن ، لێخن، شێلی |
| كدر - دردي | Lees = Dregs = turbidness | لێڵی ، لیخنی ، هەر مادەیەك لە بنی قاپی شلەدا بنیشێت. |
| كدري، جوني، غضف | Big sand grouse = large pin tailed sand grouse = petrocles | كەودەری ، قەتییەكی جوانی گەورەی كلك درێژە، بەر سكی رەشە لە ناوچە سارەدكاندا دەژی. |
| كدرية - كدري - كدارية | | راجع (قطاكدرية). |
| كدس | Hoardingup = toheap up | كەڵەكەكردن، خستنە سەر یەك. |
| كدس-كومة | A heap = pile | كەڵەكە، كۆمەڵ. |
| كدم - كدمة | Ecchymosis = bruise | كوتراویی، شوێنی داخكردن، تەقزی خوێنتێزان، پڕانی خوێن لەژێر پێستدا كە دەبێتە هۆی شی و مۆر بوونەوە.ئینجا سەوزو زەرد بوونی ئەو شوێنە. |
| كدمة | Fatted ewe | مەڕی قەڵەو = مەڕی دابەستە |

| | | |
|---|---|---|
| كدوة | Leaf spot | بەڵەی گەڵا ، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە دەدات لە گەڵای برنج و هەرزن و گەنم و مۆزو سێ‌پەرە |
| كديس - رباح - زريقاء | Genet cat | گیاندارێکە گۆشتخۆرە لە پشیلە دەچێت. |
| كديش - برزون | Clydesdale = nag = pack horse | بارگیر، کەری بار، ئەسپی بار. |
| كذو - كوربريل | Courbaril tree | درەختێکی گەورەی جوانە تەختەکەی بە نرخە مادەیەکی رێسینی زەردی نایاب لە قەدەکەی دەردەهێنرێت بۆ بۆیەکردن بەکاردێت. |
| كراء - كروة - اجرة | Rent = wage = pay | کرێ. |
| كرى - نعاس | Slumber | وەنەوز ، خەوبردنەوە، چاوجوونەخەو چرت ، خەوەنۆچکێ نوقرۆسك. |
| كراب - كرب | Scarifiage | شیکردنەوەی چینی سەرەوەی زەوی. |
| كرابس | Craps | کراپس ، جۆرێکە لە یاری قومار بە دوو زار(نرد) دەکرێت. |
| كرابي | Crappie | کراپی ماسی‌یەکی بچووکی رووبارییە. |
| كرابتوليت - غرابتوليت | Graptolites = graptozoa | گراپتولایت = بەردەنوس ، کۆمەڵە گیاندارێکی قڕ تێ کەوتووی زۆر کۆنن بە شێوەی بوو بەرد (بە بەرد بوو) هەن. |
| كراتونيت | Gratonite | (گراتۆنایت) مەعدەنێکە لە کۆگردیدی زەرنیقی قورقوشم پێکهاتووە بە شێوەی بلووری پوازکی شەشی هەیە. |
| كراث ، كراث - براصة - كراث رومي | Porrum = leek | کەوەر ، سیرەوکە ، سیقسیقۆك رووەکێکە بە شێوەی بەهارات بەکاردێت. |
| كراث اندلسي - قفلوط | Shallot = scallion | شالۆت - کەوەری ئەندەلوسی |
| كراث وردي - قرط | Rose flowered garlic | جۆرێکە لە کەوەر گوڵەکەی پەمبەیی‌یە. |
| كراث نبطي - بصل العفريت - كرات الدب | Vine leek = wild leek | پیازی دێو ، روەکێکی پیازی دەشتەکی‌یە، بە کوڵاوی دەخورێت، وە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| كراث بري - طيطان | Wild leek = crow garlic = crowonion | قورادە ، کنێول ، کەوەرە کێویلە ، سیرەوکە لە رەنگ و تامدا لە کەوەر دەچێت. |
| كراث جبلي - حشيشة الكلب - فراسيون ابيض | Hore hound | کەوەرە کێویلە |
| كراث اسباني - كراث الصخور | Spanish garlic = Rockambole = sand leek = chive | کەوەری ئیسپانی. |
| كراث منزلي | House leek | کەوەرە ماڵی - رووەکێکی جوانە گوڵی زەردو پرتەقاڵی دەگرێت بۆ رازاندنەوەی ناوماڵ. |
| كراج - مراب | Garage | گەراج ، شوێنی دانانی ئوتومبێل. |
| كرارجي | Steward = butler | سەرکار - وەکوو سەرکاری کشتوکاڵ و خانووبەرە. |
| كرارية | Ball of twine | کلافەی دەزوو. |
| كرار- بيت المؤونة | Pantry = celler | ژووری زەخیرە - ژووری ئازووقە |
| كراز ارضي - فستق العبيد | Peanut | گویزی زەوی ، بستەی کۆیلەکان. |
| كراسة - كتيب | Pamphlet = Copy book | نامیلکە. |
| كراسنيتين | Crasnitin | (کراسنیتین) دەرمانێکە دژی وەرەم بەکاردێت ، بە شێوەی دەرزی هەیە. |
| كراشة | Shot holeborer | مێرووەیەکی قاوەیی‌یە، زیان بەخشە بە درەخت. |

| | | |
|---|---|---|
| كراع - باچه كوارع | Trotters | سەروپێ پاچە ، سەروپێچك ، لواقە ، جورە ، خواردەمەنیەکە. |
| كرافت | Kraft | كرافت، كاغەزێكی قايمه لە كرۆكی درەخت دروست دەكرێت. |
| كرافيت - جرافيت = غملول - اسرب - اسروب | Graphite = plumbago | (گرافيت) جۆرێكه لە كاربۆن (خەڵوز) ی پاك بۆ دروست كردنی قەڵەمی رەش و پيلی كارەبا بەكاردێت، بە شێوەی بلووری هەيە. |
| كرافية - رباط العنق | Neck tie = cravat | بۆينباغ - قەرەوێتە. |
| كراكة - كراءة - جرافة | Dredger machine | مەكينەيەكە بۆ پاك كردنەوەی بنكی چەم بەكاردێت، مەكينەی جۆماڵ كردن، شۆفڵ. |
| كرال | Kraal | كرال ، تەويلەی گياندارە ماڵیەكان لە (ئەفەريقا). |
| كرام | Viticulturist | رەزەوان، باخەوانی رەز. |
| كرامة - زراعة الكرم | Viticulture | رەزەوانی - كشتوكاڵی رەز و مێو. |
| كرانوديوريت | Granodiorite | گرانۆديۆرايت - كەڤرێكی ئاگرينە لە ناخی زەويدا ، پەيدا بووە، لە سليكاو فيلسپار و ميكاوهۆرنبلێند پێك هاتووە. |
| كرانيتي- غرانيتي | Granitic | گرانايتی، هەرشتێك پەيوەندی بە گرانايتەوە هەبێت. |
| كرانيت - غرانيت - جرانيت | Granite | گرانايت - بەردێكی ئاگرينە، دەنكۆڵەكانی درشتن لە كوارتز، بە رێژەی ٢٥٪ برێكی زۆر لە فيلدسپار و ميكاو كانزای رەنگاورەنگی تر پێك هاتووە، بە رەنگی رەش و پەمبەيی هەيە، لە ناوچەی ئەسوان لە ميسردا زۆرە بەردێكی پتەوە لەبەر ئەوە لە دروست كردنی مەكينەی قورس و ساختماندا بەكاردێت، لە ناخی زەويدا پێك هاتووە. |
| كرانوسان | Granosan | (گرانۆسان) دەرمانێكە بۆ چارەكردنی نەخۆشی رووەكی. |
| كراوية - كراويا - كرويا - كمون ارمني - قرنباد (فارسية) | Caraway | (كەراويە) ، جۆرە رووەكێكە تۆوەكەی بۆن خۆشە لە شوێت و رازيانە دەچێت، بەرەكەی بۆ بەهارات بەكار دەهێنرێ هەروەها رۆنی لێ دەر دەهێنرێ تۆوەكەی، حەڵوای لێ دروست دەكرێت ، هەروەها دەكرێتە مەیيەوە. |
| كراكي - بلميطة | Pike = pik fish | جۆرێكه لە ماسی. |
| كرايوليت - كريولايت سبار جرينلاند | Cryolite = Green land spar | سپاری گرينلاند - (كرايۆلايت) كريۆلايت، بريتيیە لە فلوريدی ئەلەمنيۆم و سوديۆم(سوديۆم ئەلەمنيۆم فلورايد) بە شێوەی كريستاڵ ، بە زۆری لە بەردی گرانيتدا هەيە، ئەلەمنيۆمی لێ دەردەهێنرێ هەروەها بۆ دروست كردنی فەخفوری بەكار دێت، يەكێكە لە كەرەسە خاوەكانی فلۆر. |
| كرب - هم | Grief = distress | خەم، خەفەت. |
| كرب - كرنافة | The base of the leaf of the date palm | لاسيكی گەڵای دارخورما، توێكڵی قەدی دارخورما |
| كرباج - سوط | Whip | قيرباچ ، قەمچی |
| كرباجية | Wildratan | رووەكێكی سەلك دارە لە ناوچە گەرمەكان دەروێت لە گوێ ئاودا، گەڵاكەی مەيلەو شينە تەرزی پێوەيە. |
| كربال - مندف | Teasing bow | كەوانەی ئامرازی هەلاجی |
| كربازول | Carbazole | كاربازۆل، ئاوێتەيەكی بلوورييە گەلێك بۆيەی لێ دروست دەكرێت. |
| كربتون | Krypton | كريپتۆن، توخمێكی كيمياگەرييە كێشی ئەتۆمیيەكەی(٨٤) ە ژمارە ئەتۆمیيەكەی (٣٦) ە گازێكی بێ رەنگە ناوەكەی لە ووشەی كريپتۆس واتە (شاراوە) وەرگيراوە، نيشانەكەی (KR). |

| | | |
|---|---|---|
| كرية | Crabwood tree = carapa oil tree | درەختێکی گەورەیە لە کۆمەڵەی ژمەرە ماسی ، بەرمکەی لە تورمکە دەچێت، ریشاڵاوییە، مادمیەکی چەوری زەرد لە کاکڵەکەی بەرمکەی دەردەهێنرێت، دژی گەستنی مێروو بەکاردێت، هەروەها بۆ دروست کردنی سابون، مادەیەك لە توێکڵی قەدەکەی دەردەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی تا (حمى). |
| كريز | | ترۆزی چەمیلە. |
| كريل - شفش | Umbrino | ماسییەکی نێسکداری پەرەکە دڕکاوییە. |
| كريل | Calico -bush | ڕوەکێکە گەڵاو گوڵەکەی ژمەرە گوڵەکەی بە شێوەی هێشوە پەمبەیی یا سورە. |
| كريلة - كاربيل - خباء | Carpel | پارچەی هێلکەدانی ڕوەك، گەڵایەکی گۆڕاوە ، بە تەنها یان لەگەڵ هی تردا هێلکەدانی گوڵی لێ پێك دێت. |
| كريفروت - ليمون الجنة | Grape fruit | گرێپفروت - لیمۆی بەهەشت جۆرە لیمۆیەکی گەورەیە. |
| كربنة | Carbonation | کاربۆناندن - ئامادەکردنی ئاوی سۆدە، بەوەی کە گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بکرێتە شەراب و شەربەتەوە. |
| كربنة - تفحيم - تكرين - تفحم | Carbonization | کارباندن، هەر مادەیەك (وەکو مەعدەن) کاربۆنی تێ بکرێت. |
| كربنة | Carbonylage | کاربۆنیل کردن = کرداری بۆیەکردنی شتومەکی تەختە بە کاربۆنیل بۆ پاراستنی لە فەوتان. |
| كربوني | Carbon Iferaus | کاربۆنی سەردەمی کاربۆنی. |
| كربوني | Carbona Ceous | کاربۆنی ، مادەیەك دەوڵەمەند بێت بە کاربۆن. |
| كربونات البريليوم | Beryllium carbonate | کاربۆناتی بریلیوم ، تۆزێکی سپییە لە ئاودا ناتوێتەوە. یاسای کیمیایی $BeCo_3 + Be(OH)_2$ |
| كربون ١٤ | 14 | کاربۆن ١٤، هاوتایەکی سروشتی تیشك دەرەوەی کاربۆنە لە دەست نیشان کردنی مێژووی مادە کیمیاییەکان و بە دوو کەوتنی مادە کیمیاییە تیشك دەرەوەکاندا بەکاردێت. |
| كربونات الكادميوم | Cadmium carbonate | کاربۆناتی کادمیۆم ، تۆزێکی سپی ژەهرینە یاسای کیمیایی - $CdCo_3$ لە ئاودا ناتوێتەوە، لە ترشە ڕوونەکاندا دەتوێتەوە. |
| كربونادو | Carbonado | کاربۆنادۆ، ئەڵماسی ڕەش. |
| كربونات البزموث القاعدية | Bismuth Carbonate basic = bismuth subcarbonade | کاربۆناتی بزموثی تفت، تۆزێکی سپی بێ ڕەنگی بێ تامە لە ئامادەکردنی ئاوێتەکانی بزموث دەرمانی ئارایشت و چارەکردنی کولکی گەدە (قرحه المعده) مینا و سیرامیکدا بەکاردێت.، یاسای کیمیایی $(BiO)_2Co_3$ . |
| كاربونات الالمنيوم | Aluminium carbonate | کاربۆناتی ئەلەمنیۆم، بە شێوەی تۆزێکی سپی هەیە، جاران وەکو دەرمانی گیرکەر (قابض ) بەکار دەهێنرا. یاسای کیمیایی $AL_2O_3.Co_2$. |
| كاربونـــات الالمنيـــوم المائية | Aluminium carbonate hydrate | کاربۆناتی ئەلەمنیۆمی ئاویی ، وەکو تۆزێکی سپی هەیە لە داوو دەرمانی ئارایشت و بۆیەو کاغەزی تایبەتی و وێنەگرتنی فۆتۆگراف و قوماشی خوری دا بەکاردێت، یاسای کیمیایی: $AlCl_3.H_2O$ . |
| كربونات الامونيوم | Ammonium carbnate | کاربۆناتی ئامۆنیۆم بە شێوەی یلێتی بلوری بێ ڕەنگ یان تۆزێکی سپی هەیە، لە دروست کردنی خوێیەکانی ئامۆنیۆم و دەرمان سازیداو بیکینگ پاودەرداو مادەکانی کوژاندنەوەی ئاگرو جێگیرکردنی ڕەنگی قوماشدا بەکاردێت.یاسای کیمیایی $(NH_4)HCo_3$ . |

| | | |
|---|---|---|
| كربونات الباريوم | Barium carbonate | كاربۆناتی باریۆم ، تۆزێکی سپییە لە سروشتدا لەمەعدەنی (ویزیرایت (witherite)) دا هەیە، لە سازدانی ئاوی سوێرداو لە دەرمانی لەناوبردنی گیاندارە قرتێنەرەکانداو لە پیشەسازیی سیرامیکو شووشەی دژی تیشك دانەوەدا بەکاردێت. |
| كربون كرافيتي | Graphite carbon | کاربۆنی گرافیتی ، ئەو کاربۆنە پاکەیە کە لە ئاسنی دارشتەدا پەیدا دەبێت، لە کاتی ساردکردنەوەیدا کە لە کورەکە دێتە دەرەوە. |
| كربونات | Carbonate | کاربۆنات ، ئاوێتەیەکە لە ئەنجامی کارلێکی کانزایەك یان ئاوێتەیەکی ئەندامی لەگەڵ ترشی کاربۆنیکدا پەیدا دەبێت، ئەگەر کارلێکەکە لەگەڵ کانزادا بێت، ئەوا بەرهەمەکەی پێی دەوترێت خوێ وەکوو خوێی کاربۆناتی کالیسیۆم. |
| كربوهيدراز | Carbohydrase | کاربۆهایدرێز - ئەو ئەنزیمەیە کە کاربۆهیدراتە ئاڵۆزەکان شی دەکاتەوە بۆیەکەی ساکارتر وەکو ئەمیلێز ، ئینفێرتێز، ماڵتێز. |
| كربوران | Carborane | کاربۆران - کاربۆرێن ، ئاوێتەیەکی بلورییە لە بۆرۆن و کاربۆن و هایدرۆجین پێك هاتووە. |
| كربومايسين | Carbomycin | کاربۆمایسین ، ئاوێتەیەکی دژە ژیانە لە مەیانی پزیشکیدا بەکاردێت. |
| كربونات الكروم | Chromium carbonate | کاربۆناتی کرۆم ، بە شێوەی تۆپەڵێکی شینی مەیلەو خۆڵەمێشی هەیە مادەیەکی ژەهرینە. |
| كربون منشط - كربون نشيط | Activated charcal = activated -carbon | کاربۆنی چالاك کراو |
| كربوني | Carbonic | کاربۆنیك - هەر شتێك پەیوەندی بە کاربۆنەوە هەبێت. |
| كربونات الفوقس | Varec = Varech | کاربۆناتی فیوکەس - جۆرێکی ناپاکە لە کاربۆناتی سۆدیۆم لە قەوزەو گیایی دەریایی دەردەهێنرێت. |
| كربونات السيزيوم | Cesium carbonate $Cs_2 Co_3$ | کاربۆناتی سیزیۆم ، تۆزێکی سپییە لە ترشاندنی (هەوێن کردنی) ئاوی (مەعدەنی) و دروست کردنی شوشەی تایبەتیدا بەکاردێت). |
| كربونات السيروز - كربونات السيريوم | Cerous carbonate | کاربۆناتی سیرۆز - کاربۆناتی سیریۆم تۆزێکی سپییە.یاسای کیمیای $Ce_2 (Co_3)_3\ 5H_2o$ |
| كربونات الكوبلتوز - كربونات الكوبلت | Cabaltous carbonate | کاربۆناتی کۆبالتۆز ، بە شێوەی بلووری سوور هەیە، لە ئاودا ناتوێتەوە، کێشی جۆری ٤،١٣ لە دروست کردنی سیرامیك ، یاسای کیمیایی $CaCo_3$. |
| كربونيل الكوبلت - رابع كربونيل الكوبلت | Cobalt carbonyl | کاربۆنیلی کۆباڵت. |
| كربونات الكالسيوم | Calcium carbonate ($CaCo_3$) | کاربۆناتی کالسیۆم، بە شێوەی تۆزێکی سپی یان بلووری بێ رەنگ هەیە بێ تامو بێ بۆنە، زۆر کەم لە ئاودا دەتوێتەوە یەکێکە لە مادە ئاساییە زۆر بڵاوەکانە لە سروشتدا ، لە سروشتدا بە شێوەی ئەراگۆنایت (aragonite) و سەدەف (قاقڵەی) گوێچکە ماسیو شەیتانۆکەو کالسایتو دەباشیرو بەردی قسڵو مەڕ مەڕو قوڕو تراڤەرتین (travertine) هەیە سەرچاوەیەکە بۆ لەو ناواخن کردنی هەیە لاستیك پلاستیك ، بۆیەو پیشەسازی کاغەزو ، تۆزی ددانو چیمەنتۆی پۆرتلاندو پەیداکردنی ($Co_2$) . |

**کربوراندم - کربورندم** Carborundum

کاربۆراندەم ، مادەیەکی رەقە بۆ ساف کردن و کراندن و بەرگری کردنی گەرمی بەکاردێت کاربۆراندەمی کاربیدی سلیکۆنی بە شێوەیەکی بلووری‌یە لە رژێمی شەش گۆشەیی ، بلوورەکەی رۆشنی مەیلەو تەڵخە، رەنگەکەی سەوزی کاڵ بەرەو شینی تێر یان رەشە ، پتەوی‌یەکەی ١٧و٩یە بە پێ‌ی پێوەرەی مۆهس (Mohs) کێشی جۆری‌یەکەی (٣و٠٦ ٣و٢٠) ناتەقێتەوە، ترشەکان کاری لێ ناکەن بۆ کراندن و ساف کردن و هاڕینی مادەی تر بەکار دێت.

**کربوهیدرات** Carbohydrate

کاربۆهایدرات، ئاوێتەیەکە لە توخمی کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین پێك هاتووە، وە رێژەی هایدرۆجین بۆ ئۆکسجین تیایدا ، وەکو هی ئاوە کاربۆهیدراتەکان بڵاوترینی جۆری ئاوێتە ئەندامی‌یەکانن رێژەی ٣/٤ لە کێشی بەروبوومە ووشکەکان پێك دەهێنن هەروەها لە لەشی گیاندارەکانیشدا بە بەربڵاوی هەن کاربۆهیدراتەکان لەم کۆمەڵانە پێك هاتوون:-

١-شەکرە تاکی‌یەکان - شەکرە ساکارەکان واتە (mono saccharides) وەکو شەکری فرکتۆزو گلوکۆز ، یاسای کیمیایی - $C_6H_{12}O_6$

٢-شەکرە دوانی‌یەکان (disaccharides) وەکوو سوکەرۆز، ماڵتۆز ، یاسایی کیمیایی $C_{12}H_{22}O_{11}$ .

٣-شەکرە چەندینەیی‌یەکان (سکرایت) متعددە - polysaccharides وەکو نیشاستەو سلیلۆز ، شەکرە ساکارەکان بلورین و لە ئاودا دەتوێنەوە، تامەکەیان شیرینە.

**کربون ( C )** Carbon

(کاربۆن) توخمێکی ناکانزایی‌یە ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٦) و کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (١٢) هاوهێزی‌یە ئاسایی‌یەکەی (٤) کاربۆن دوو هاوتای جێگیرو چوار هاوتای تیشکدەرەوەی هەیە، هاوتای کاربۆن (١٢) کە لە ٩٩٪ توخمەکە پێك دەهێنێت کاربۆن (١٢) کراوە بە پێوەرێك بۆ پێوانەی کێشی ئەتۆمی توخمەکانی تر ، کاربۆن دوو شێوەی بلووری هەیە (ئەڵماس ، (گرافیت)و، بە چەند شێوەیەکی نا بلووریش هەیە، وەکوو : خەڵوز ، خەڵوزی رووەکی و رەشی (مەنجەڵ) هیس کاربۆن لە پێکهاتنی هەموو ئاوێتە ئەندامی‌یەکان و کەمێك لە ئاوێتە نائەندامی‌یەکاندا بەشدارە ، توخمێکی چالاکە لە کرداری پێکهێنانی رووناکی‌یانەدا، لەبەر ئەوە لە ژیانی هەموو رووەك و گیاندارەکاندا رۆڵی خۆی دەبینێت، هاوتا تیشکدەرەکەی (C14) بۆ شوێن کەوتن و پشکنینی توخمەکان و دەست نیشان کردنی مێژووی مادە کیمیایی‌یەکان کاربۆن مادەیەکی لێکەرەوەی (مختزل) بەتینە، لەبەر ئەوە بۆ پاککردنەوەی کانزاکان بەکاردێت، تاکە توخمەکە توانای پێکهێنانی چواربەندی هاوبەشی هەیە، گەیاندنی کارەبایی بەهێزە بۆیە لە دروست کردنی پۆڵ کارەبایی (ئیلیکترۆد) و ئامرازی کارەباییدا سوودی لێ وەردەگیرێت، کاربۆن ئاوێتەی دوانی لەگەڵ کانزاو ناکانزاکاندا پێك دەهێنێت، پێیان دەوترێت کاربیدەکان.

| | | |
|---|---|---|
| كربـــــون ١٤ - كربون مشع | 14 radio carbon | (كـاربۆن ١٤)، كـاربۆنی تیشـكدەرەوە ، هاوتایـەكی كـاربۆنی چالاكـە لـە تیشكدانەوە ، بە شێوەیەكی سروشتی هەیە ، ژمارەی بارستی‌یەكەی (١٤) یە بـارێكی تایبـەتی لـە چالاكی تیشـكدانەوەی هەیـە لـە لایـەن تیشـكی گەردونی‌یەوە هان دەدرێت نیوەی تەمەنەكەی (٥٥٨٠ ساڵە) سەرچاوەیەكە بـۆ تیشـك دانـەوە لـە گێـج (gauge) و ئـامرازە ئەسـتوركراوەكاندا ، لـە كانزاكردن‌و كارلێكـە بایۆلۆجی‌یـەكاندا كـاربۆنی تیشـك دەرەوە بـۆ دەست نیشـان كردنـی مێـژوو لـە زەوی ناسـی (جیۆلۆجـی) شـوێنەوار ناسـی (archaeoIogy) دا بەكاردێت. |
| كربينول | Carbinol | كاربینۆل ، میثانۆل ، ئەلكهولی میثانۆل . |
| كربيد | Carbide | (كاربید) ناوێتەیەكی دووانی‌یە لە كـاربۆن‌و توخمێكـی تـر پێـك هـاتووە، ناسراوترینی كاربیدەكان كاربیدی كالسیۆم ، سیلیكۆن ، بۆرۆن ، ئاسن. |
| كربيد الكروم | Chromium carbide | كـاربیدی كـرۆم ، بـە شـێوەی بلـووری لەبزینـەیی هەیـە وەكـو تۆزێـك دەپرژێنرێت ، بۆ رووكەش كردنی مادەكان لە پێكهاتی ترومپاو زمانـەدا (صمام) بەكاردێت. |
| كربيد البورون - بورال | Boron corbide | كاربیدی بۆرۆن، بۆرال ، بە شێوەی بلووری رەقی رەش هەیە، بە شێوەی تـۆزی كرێنـەر (abrasive) و شیشـی دابینكـەر (قضيـب السـيطرة) لـە كارپێكـەرە ناوكی‌یـەكانداو لـە پەیكـەری فرۆكـەی جـەنگیدا بـەكار دێـت، یاسای كیمیایی - $B_4C$ . |
| كربيد (كاربيد) الألمنيوم | Aluminium carbide | كـاربیدی ئەلـەمنیۆم ، تۆزێكـی یـان بلوورێكـی زەردە زوو گۆڕدەگرێـت، بـۆ پەیداكردنی گازی میثان ولە سازكردنی مەعدەنەكان‌و وەكو كاركەرێكی یاریدەر بەكاردێت. یاسای كیمیایی $AL_4C_3$ |
| كربيد البريليوم | Bery llum carbide | كاربیدی بریلیوم ، بـە شـێوەی بلـووری رەتكـەرەوەی (refractory) رەقی شەش گۆشەیی وورد هەیە، بە هەڵمژین لە لووتەوە ژەهرینە ، لە كارەكانی ووزەی ئەتۆمی‌و سوتەمەنی موشەكدا بەكاردێت. یاسای كیمیایی $Be_2C$ . |
| كربيد الكالسيوم | Calcium Carbide ($Cac_2$) | كـاربیدی كالسـیۆم ، مادەیـەكی رەشـی مەیلەو خۆڵەمێشی رەقە ، بۆنـی سیری لـێ دێـت، لـە ئـاودا شـی دەبێتـەوەو گـازی ئەسـیتیلن دەدات‌و هایدرۆكسـیدی كالسـیۆمی لـێ بەجێ دەمێنێـت، بـۆ پـەیداكردنی گـازی ئەسـیتلین كـە لـە لـەحیم كردنـدا بـەكاردێت لـە دروسـت كردنـی نیوپریـن (neoprene) دا بەكاردێت. |
| كربيد مقاوم | Refractory carbide | كاربیدی بەرهەڵستیكار ، جۆرێكە لە كاربید زۆر رەقـەو بەرامبـەر گـەرمی جێگـیرەو پلـەی شـلەوە بوونـی بـەرزەو بەرهەڵسـتی مـادە كیمیایی‌یـەكان دەكات، وەكو كاربیدی سلیكۆن‌و بۆرۆن‌و وەكو مادەی كرێنـەر ، ناوپۆشی تەنوور ئەو مادانەی تر كە بەرهەڵستی گەرمی دەكەن، بەكاردەهێنرێت. |
| كربين - ميثلين | Carbene = methy lene | كاربین - مثیلین رەگێكی ئەندامی‌یە، كاربۆنی دوو هاوهێزی تێدایە. |
| كرتل | Kirtle | كیرتل ، كراسێكی ژنانەی درێژە. |
| كرتون - ورق المقوى | Mill board = card-board = cartoon | كارتۆن - مقەبا |
| كرتون مموج | Card board | كارتۆنی چرچ ، كارتۆنی شەپۆلدار ، بۆ پاراستنی شتومەك لە شكان لـە سندوقدا دادەنرێت. |
| كرة - مرة | Turn = bout = round | كەرەت ، جار. |

| | | |
|---|---|---|
| كرة | Sphere = globe = globos | تۆپ ، خڕۆك ، گۆ. |
| كرة القدم | Foot ball | فوتبۆل ، تۆپی پێ، فتبوڵێن. |
| كرة السلة | Basket ball | باسكه ، تۆپی سەبەتە. |
| كرة الطائرة | Volley Ball | ڤالی بۆل - یاری باڵە. |
| كرة التنس - كرة المضرب | Tennis | تۆپی تێنس. |
| كرة البليارد | Billiard ball | تۆپی بیلاردۆ - جۆرە یارییەکە بە تۆپو دار لەسەر مێز دەکرێت. |
| كرة مغناطيسية - الجو المغناطيسي | Magnet osphere | خڕۆکی موگناتیسی ، کەشی موگناتیسی. |
| كرة سماوية | Celestial globe | خڕۆکی ئاسمان، ئەو خڕۆکەیەی کە تەنە ئاسمانییەکان دەنوێنێت، خڕۆکێکی ئەندێشەیی (وەهمی) یە. |
| كرة الأعماق - غرفة الأعماق | Bathysphere | ژووری ئاخ، ژوورێکی خڕە لە ئاودا نوقم دەکرێت. بۆ خوێندنی زیندەوەرەکانی بنی دەریا. |
| كرة صغيرة - كرية | A little ball | خلێرە ، تۆپی بچووك |
| كرة من الصوف - شليلة | Skein of thread | خلینە، کلۆڵك، کلۆڵکا بەنکا. |
| كرة الأرض | Terrestial | گویْ زەوی ، خڕۆکی زەوی ، گۆی زەمین ، خڕۆکی زەمین. |
| كرة العين - مقلة العين | Eye- ball | گۆی چاو ، گلێنەی چاو ، چاو. |
| كرة النار - كرة نارية | Fire ball | تۆپی ئاگر ، خڕۆکەی ئاگر ، خڕۆکێکی گڕکرتووە لە گازی گەرم پێك هاتووە، لە دوای تەقینەوەی ناوکی بە ماوەیەکی یەکجار کەم پەیدا دەبێت، ئینجا راستەوخۆ دەکشێتو سارد دەبێتەوە. |
| كرة البيلسان | Pith ball | تۆپی بەیلەسان ، تەنێکی خڕی بچوکە لە کرۆکی رووەکی (بەیلەسان) دەردەهێنرێت لە هەندێك تاقیکردنەوەی کارەباییدا بەکاردێت. |
| كرة ضوئية | Photosphere | رووی رووناکی خۆر. |
| كرة الثلج خنقار الكركي - بلسان ابيض - الفلوس امرد = خمان الماء - بلسان الماء | Water elder = snow ball - tree | تۆپەڵە بەفر ، دەنوکی قولنگ ، دەوەنێکە چەند جۆرێکی هەیە لقەکەی نەرمە بۆ دروست کردنی سەبەتە بەکاردێت، هەندێکی گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویەکی سپیە. |
| كرة الطاحونة | Mill ball | تەمۆ. |
| كرة مركزية | Centro sphere | سینترو سفیر ، گۆی ناوەندی گۆی چەقی ، خڕۆکی چەقی ، بەشێکە لە تەنی ناوەندی سایتۆ پلازمی خانەی زیندەوەر. |
| كرجاتوفيوم - كوردتۆفيوم | Kurchato Vium = khurchato Vium | کەرجاتۆڤیۆم ، توخمێکی کانزایی دەستکردە تازە دۆزراوەتەوە ژمارەی گەردیلەیی (١٠٤) کێشی گەردیلەیی (٢٦١) لە ساڵی (١٩٦٨) لە لایەن زانایەکی سۆڤێتییەوە دۆزراوەتەوە نیشانەکەی (Ku). |
| كرخانة - ماخور - بيت العاهرات | Brothel = bawlyhouse = whoreshop | قەحبەخانە - کارخانە |
| كرد - اكراد | Kurds = Kurd | کورد ، میللەتی کورد. |
| كردي | Kurdish | کوردیی ، کەسێك کە کورد بێت. |
| كردستان | Kurdistan | کوردستان - خاکی کورد. |
| كرد | Basis of the neck | بنی مل ، شوێنی راگیربوونی مل لە لەشدا. |
| كرد - مشارة | Lease | مشارە ، مشارە لە زەوی کشتوکاڵ. |

| | | |
|---|---|---|
| كرد | Cord | پێومرێکە بۆ دار (حطب) دەکاتە ١٢٨ پێ خشتەکی (قدم مکعب). |
| كرد - عشبة السبع - دفنة قاتلة. | Silver leaved daphne | گیایەکی دەشتەکی ژەهرینە گوڵەکەی سپیو بچووکە، |
| كردان - قلادة | Necklace | گەردانە ، ملوانکە. |
| كردان السيارة | Propeller shaft | شەفتی ئوتومبیل. |
| كردلين | Cordyline | (راجع قبب) |
| كردهان | Codonopsis | گیایەکی دەشتەکیو رازاندنەوەیە، رەگەکەی گۆشتنە، گوڵەکەی بە شێوەی زەنگوڵەیەکی شۆڕە، بە رەنگی فستقی یان شین یا سپییە. |
| كردوس | Epiphysis | ئیسکێکی ئەستوری تەواو. |
| كردينال ( طير ) | Cardinal | (کاردینال) باڵندەیەکی ئەمەریکی دەنگ خۆشە، رەنگی نێرەکەیان سورە، سەری رەشە. |
| كر - كره - هجوم | Attack | هێرش ، پەلامار. |
| كر | Re- | پێشگرێکە بە مانای دووبارە کردنەوە یان سەر لە نوێ وەکوو لە ووشەی (استئناف) reopen واتە دەست پێ کردنەوە. |
| كرز | Cherry tree mazzard = cherry (prunus) | گێلاس، گەراس ، ئارژینك ، ئالوباڵۆ ، درەختێکە بەرەکەی سورو ووردو خۆشە بە شێوەی هێشوە، لە هەڵوژە دەچێت بۆ خواردن دروست کردنی مرەبا بەکاردێت گوڵەکەی سپییە. |
| كرز الطيور = كرز حلو | Gean cherry = hedge berry | جۆرە گێلاسێکی کشتوکاڵیە ، درەختەکەی گەورەیە، نزیکەی (٢٠) مەتر بەرز دەبێتەوە بەرەکەی خڕەو ووردو شیرینو خۆشە. |
| كرز الغاز - كرز غازي | Cherry laurel | دەونێکی هەمیشە سەوزە بۆ پەرژینی باخچەکان دەروێنرێت، گەڵا ساقەکەی مادەیەکی ژەهرینی تیایە پێی دەوترێت ترشی (پروسیك) |
| كرزات | | چەرەس ، شەوچەرە ، ئاجیل ، برێشکە. |
| كرز بري - قراصيا - برقوق كرزي | Moreello cherry = Bird cherry = Hach berry = Hog cherry | بەڵاڵوك ، گێلاسە کێویلە ، هەڵاڵوك ، بەرەکەی وردە بە شێوەی هێشو ئامەکەی تفتە ، گوڵەکانی بچوکنو ئادیارن رەنگیان زەرد یان شین، کاسەی گوڵەکەی سورە ، بەرەکەی بۆ خواردن دەست دەدات. |
| كرز بربادوس | Barbados cherry | گێلاسی باربادۆس ، بەرەکەی تاڵە، جۆرێکە لە گێلاس بەرەکە توونە . |
| كرز حامض - وشنة | Sourcherry | گێلاسی ترش. |
| كرز سانت لويس - كرز معطر - محلب = كرز محلب | Perfumed cherry = St. Lucy cherry = Mahaleb cherry | کینار ، کیناری ، مەڵحەم، مەحەم، مەحلەب، دەوەنێکە بەرەکەی کەمێك شیرینو تفتو لینچو سوورە لە بەری بەڵاڵوك دەچێت. |
| كرس - مراح | Goat pen | پشتیر ، کۆتان ، شوێنی حەوانەوەی مەڕو بزن. |
| كرسف - كرسوف | | راجع كلمە (قطن) |
| كرسفية - غنفال - دم الغزال | Gnaphalium = Ever lasting | (گنافالیم) - روەکێکی دەشتەکییە، قەدو گەڵاکەی توکنە ، گوڵەکەی سور یان لەیلاقی یە بۆ کۆکە باشە. |
| كرسنة - بيقة - كشني | Ervil = Ers = Bitter vetch = lintel Vetch = vetch | کزن ، کچنی - روەکێکە دەنکەکەی توێکڵ دارە، بۆ ئالیك بەکاردێت، بە تایبەتی بۆ مانگا گوڵەکەی بنەوشەییە دەنکەکەی ووردو قاوەییە. |

| | | |
|---|---|---|
| كرسوع | Carpelend of the ulna | ئێسقانی قەڵەمی بچوکی باسکی دەست = بەوشی بچووك. |
| كرسي | Chair =seat | کورسی ، ئەسکەمل. |
| كرسي التشهير | Cucking stool | کورسی بە پەنگ کردن، کورسی‌یەکە ئافرەتی خراپو پیاوی خراپو تەڵەکەبازی لەسەر دادەنیشرێن بۆ بە پەنگ کردنیان. |
| كرسي الأعتراف | Confessional = chair | کورسی دان پیانان. |
| كرسي الملك - عرش | Throne | کورسی پاشا ، عەرش. |
| كرسي المصور | Pictor | کورسی وێنەگر : کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشوورییە. |
| كرسي بلا ظهر | Stool | ئەسکەمل ، کورسی بێ پشت. |
| كرسي خيزران | Cane chair | کورسی خەیزەران. |
| كرسي رولمان بلي - كرسي كريات - حامل الكريات | Ball bearing | بۆڵ برین، بریتی‌یە لە چەند تۆپێك لە پۆڵا ستونی خولاوەی لەسەر دەوەستێت وەکو بۆڵ برینی ئوتومبێل. |
| كرسي رافع | Sus pention | کورسی بەرزکەرەوە. |
| كرسي قش | Rush chair = wicker chair | کورسی پوس ، کورسی‌یەك لە لقی دارخورما یان بی. |
| كرسي قماش | Deck chair | کورسی‌یەك لە قوماش دروست کرابێت. |
| كرسي كهربائي | Electric chair | کورسی کارەبایی ، کە بۆ خنکاندن بەکاردێت. |
| كرسي هزاز = كرسي مرجحة | Rocking chair | کورسی لەراوە، کورسی‌یەکە وەکو جۆلانە وایە. |
| كرش | Rumen = Belly = paunch = alvus | ورگ ، هورگ ، ئور ، گەرك ، گیپاڵ ، گەورەترین بەشە لە گەدەی کاوێژکەرەکان. |
| كرشي | Ruminal = alvine | وورگی - هەرشتێك پەیوەندی بە وورگەوە هەبێت. |
| كرش | Cyperus alopecur | گیایەکە لە میسردا دەروێت حەسیری لێ دروست دەکرێت. |
| كرشاء - ذو قدم روحاء | Flat footed | پێ پان ، پێ تەخت. |
| كرشون - اخيون - راس الأفعى - اثنا | Barbary rag wort | گیایەکی پزیشکی‌یە ، گەڵاکەی رەنگ مێخەکی مەیلەو سەوزە، هەر لقێکی تەنها یەك گوڵی زەردی گەورەی بە سەرەوەیە. |
| كرشية - صنارة - ابرة الحياكة | Crochet | قولاپی بلووز چنین. |
| كرع | To sip (or) suck water | قوم لێدان ، هەڵ قوڕاندن، دەم نانە ناو ئاو بۆ خواردنەوە. |
| كرعان - توتياء - سفور - اخينوس - قنفذ البحر | Sea urchin | ژیشکی دەریا ، گیاندارێکی دەریایی‌شێوە خڕ یان قوپاوی هەیە، سەدەفەکەی دڕکاوی‌یە دەخورێت. |
| كرفئة | Corypha | کۆریفا ، درەختێکی قەدبارێکی رازاندنەوەیە لە کۆمەڵی دارخورما ریشاڵی لێ دەردەهێنرێت بۆ دروست کردنی شەپقە. |
| كرفئة | Chell = Empty egg | توێکڵی هێلکە ، هێلکەی بەتاڵ. |
| كرفئة نروية | Great fan palm = talipot palm | دارخورمای باوەشێنی مەزن، جۆرێکە لە درەختی کۆریفا ، قەدەکەی لوولەیی‌و قیتە لە مۆم دەچێت، نزیکەی (١٠) مەتر بەرز دەبێتەوە، توێکڵەکەی سافە گەڵاکەی زۆر سەوزە لە باوەشێن دەچێت. |
| كرفس - تراجيل | Celer = smallage = parsely | کەرەوز - سەوزەیەکە دەکرێت بە زەڵاتەو دەکرێتە چێشتەوە. |
| كرفس - كرفس نبطي | Smallage = Marsh parsley | کەرەوز گیایەکە گوڵەکەی سپی‌و مەیلەو سەوزە بە شێوەی بەهارات‌و دەرمان بەکاردێت |
| كرفس الجبل | Mountain parsley | کەرەوزە کێویلە - گیایەکی پزیشکی یە گوڵەکەی وورد‌و پەمبەیی‌یە. |
| كرفس لفتي | Celeriac = turnip rooted celery | کەرەوزە شێلمی ، جۆرێکە لە کەرەوز رەگەکەی ئاوساوە وەکو رەگی شێلم دەخورێت. |

| | | |
|---|---|---|
| كرفس عجمي | Persian Celery | كەرەوزی عەجەم. |
| كرفـــس رومـــي - مقدونس - بقدونس | Common garden parsley | مەعدەنوس ، گیایەكی تام و بۆن خۆشە لە كەرەوز دەچێت. |
| كرفس بري | Wild celery = horse parsley | مەعدەنوسی رەش ، كەرەوزی دەشتەكی گیایەكە لە مـەعدەنوس دەچێـت گەڵاكەی تام و بۆن خۆشە دەخورێت. |
| كرفس المـاء - جرجير الماء | ey = water parsnip = water cress | كەرەوزی ئاوی ، كوزەڵە. |
| كرفس البئر- شعر البنات - شعر فينوس - شعر الجن | Celery of well = Maiden hair = venus hair = (Adiantum) | قەیتەران ، گژنیژی بیر، رووەكێكە لە كەرەوز دەچێت، لاسـكەكەی رەشـە لەناو ئەشكەوت و كەندەڵاندا دەروێت وەكو لە ناوچەی گەڵی بۆ مەبەستی پزیشكی بەكاردێت. |
| كرفول - كرفون | Carvol = Carone | (كارڤۆل) شلەیەكی چەوری بێ رەنگە ، لە عەتری رازیانەو كەراویەو زیرەو نەعناو جاترە دەردەهێنرێت. |
| كرفيليا - سـنديان - بلوط قرمزي | Silk oak = scarlet oak | جۆرێكە لە داری بەڕۆ ، درەختێكی هەمیشە سەوزە. |
| كرك | Felt | كورك ، لباد ، تاتی ، تەختی. |
| كرك | Dreging | جۆماڵ ، پاك كردنەوەی جۆگە. |
| كركار | Cara cara | كارا كارا، هەڵۆیەكە لە باشووری ئەمەریكا دەژی. |
| كركب - كراسولا | Thick leaf = Crassula | كراسولا ، رووەكێكی دەشتەكی و رازاندنەوەیە گوڵەكـەی سـوورو جـوان و بۆن خۆشە. |
| كركة - امبيق | Alambic = Retort = distilling - retort | چەرتەك - ئامرازێكی كیمیاییە بۆ گەرم كردن. |
| كركدن - مرميس - وحيد القرن - هرميس - خرتيت - نوشان -زبعري | Rhinocceros | كەركەدەن، یەك شاخە ، گیاندارێكی شیردەری سەداری كەتەیە پەل كورتە سێ پەنجەی هەیە سەری ئەستوورو گەورەیە كلكی كورتە پێستەكەی زۆر ئەستوورو یەك یان دوو شاخی هەیە بە سەری لوتییەوە، لە نزیـك ئـاودا دەژی گیا خۆرە. |
| كركدن البحر - جريش البحر- ناروِيل - نرويل | Narwhal = Narwal | كەركـەدەنی دەریـا ، جۆرە نەهەنگێكـە لـە ماسـی دەچێـت ، لـە قـەراغی شەریلگەی سەرەوەیدا كەڵبەیەكی درێژی هەیە لە شاخ دەچێت ، نزیكەی (٣) مەتر درێژە. |
| كركدن منقرض | Teleoceras | (تیلیو سیراس) كەركەدەنی قڕتێكەوتوو. |
| كركدية - شاي الكوجرات - شاي احمر | CuJarattea | چایی كوجەرات ، چایی سوور. |
| كركر(طير) - نورس بني | Skua Jaeger = browngull | قـاقلی بـازانی قـاوەیی ، باڵندەیـەكی دەریـایی دڕە پەرەكـەی قاوەییـە، سەری دەنوكەكەی چەماوەیە لە قاقلی بازان دەچێت. |
| كركرة - قهقهة | Guffaw | تریقەی پێكەنین ، تریق و هوڕ ، قاقای پێكەنین. |
| كركبع - حذف | Gargany teal | جۆرێكە لە مراوی. |
| كرك | Dreger | خاكەناز، كوردو ، كەردوكێس ، كەرەك. |
| كركل | Curricle | كوریكال، گالیسكەیەكی دوو پێچكەییە بە دوو وڵاخەوە |

| | | |
|---|---|---|
| کرکم - زدوار - جدوار - اصابع صفر - هرد - ماميران - عقيد - عروق صفر | Curcuma = Turmeric = zedwary = setwall | زەردەچەوە، ئەسپەرە ، ماميران ، دارەزەرد، گيايەكی سەلك دارە لە كۆمەڵەی رەنجەفيل لەناوچە گەرمەكان دەڕوێت، چەند جۆرێكی هەيە وەكوو رەش و جۆری رەنگ كردن گوڵەكەی زەردە، لە سەلكەكەی مادەيەكی نيشاستەی دەردەهێنرێت پێی دەوترێت (ئەرروتی هيندی) ، وە لە گوڵ و سەلكەكانی رەنگێكی زەردو مادەيەكی پزيشكی دەردەهێنرێت پێی دەوترێت كوركومين (Curcomine) ، هاڕاوەی رەگەكەی بە شێوەی بەهارات بەكاردێت.پێی دەوترێت كاری. |
| كركمان - حندقوق ازرق | Scented trefoil | سێ پەڕەی بۆنخۆش، كنێر ، جۆرێكە لە سێپەرە گەڵاكەی شێوە هێلكەيی و هەڵگەڕاوەيە گوڵەكەی شین و بۆن خۆشە. |
| كركند - جراد البحر - جمبري - سرطان البحر - قريدس - روبيان | Shrimp = prown = lobster = Cray fish | رۆبيان، گيانداريكی توێكڵدارە لە كوللە دەچێت لە دەرياكاندا دەژی گۆشتەكەی دەخورێت. |
| كركند - ياقوت جمري | Oriental amethyst | ياقوتی سور يان زەرد واتە ياقوتی رەنگ رۆبيانی. |
| كركند الماء العذب - سرطان النهر | Crab | قرژاڵ، گيانداریكی جومگەداری توێكڵدارە لە ئاودا دەژی. |
| كركهان - شنداب - قرصنة جمستية | Amethyst eringo | گيايەكی دەشتەكی يان كشتوكاڵیيە، گوڵی بنەوشەيی يان زەردی بۆن خۆش دەگرێت. |
| كركول - قركول | Karakol = karakul | كاراكول ، جۆرە فەروەيەكی نايابە، يان مەڕێكە فەروەكەی نايابە. |
| كركولة | Meinate | باڵندەيەكە لە كۆمەڵەی ريشۆڵە. |
| كركي - رهو - غرنوق | Crane | كەليك ، كەلك ، قولنگ ، قورينگ باڵندەيەكی ئاوی گەورەيە، هێندەی قازێك دەبێت، قاچ و ملی درێژە ، دەنووكی تيژە كلكی كورتە، رەنگەكەی خۆڵە مێشیيە، رووەمەتەكانی هێڵی رەشيان پێوەيە، مل و لاقی درێژە، لە حاجی لەق لەق دەچێت، باڵندەيەكی كۆچەرە لە كاتی كۆچ كردندا دەنگی خوێندنەكەی دێت، بە پۆل كۆچ دەكەن، سەری پارچە گۆشتێكی بچووكی سووری پێوەيە. قاچی رەشە، لە عيراق و ميسرو سوريا و توركيادا لە گوێ ئاودا دەژی. |
| كركي | Grus | قولنگ - كۆمەڵە ئەستێرەيەكی باشوورييە. |
| كركي البحر | Paracuda = seapike | (پاراكودا)، قولنگی دەريا، جۆرە ماسیيەكە ترسناكە نزيكەی (٢) مەتر درێژ دەبێت. |
| كركيش - بابونج عطر | Chamomile | بەيبون - گيايەكی دەشتەكی پزيشكی بۆن خۆشە گوڵەكەی زەردو سپییە. |
| كركي متوج | Crown -crane | قولنگی تاجدار ، كڵاوێكی زێڕينی هەيە. |
| كرلان | Courlan | (كەرلان)، باڵندەيەكی دەنوك درێژە لە ناوچە ئيسيوائیيەكانی ئەمەريكادا دەژی. |
| كرلنغ | Curling | (كەرلينك) ، بەردە خليسكێ، يارییەكە لەسەر سەهۆڵ بەندان دەكرێت. بەردی گەورەی ساف لەسەر دەخليسكێنرێت بەرەو نيشانەيەكی تايبەتی. |
| كرلين | Carline | (كارلين)، گيايەكی دەشتەكی و پزيشكییە، قەدەكەی كورتە، گەڵاكەی دڕكاوییە ، گوڵەكەی زەردە. |

| | | |
|---|---|---|
| كرم - فردوس | Vineyard | رەز - باخی مێو = واتە زەوی یەکە داری مێوی زۆر تیادا بێت. |
| كرم - كرمة العنب | Grape Vine = Cultivated Vine | مێو ، درەختی ترێ ، دەوەنێکی کەپرییە ، بەرمەکەی پێی دەوترێ (ترێ) بە تەڕی ، بە ووشکی (مێوژ) دەخورێت، هەروەها دۆشاوو باسوق ی لێ دروست دەکرێت و دەکرێت بە مەی. |
| كرمة سوداء - فاشرشين | Black bryony = snake bryony | مێوی رەش ، بریۆنی رەش ترێ، مارانەی رەش روەکێکی گیایی خۆ هەڵواسەرە. |
| كرمة - كورمة | Corm | کۆرم، جۆرە قەدێکی خڕە لەژێر زەویدا دەبێ وەکو قەدی رووەکی زەعفەران. |
| كرمة بيضاء - فاشرا بيضاء | White -bryony | بریۆنی سپی - مێوی سپی ، هەزار ئەفشان، گیایەکە لە کۆمەڵەی کولەکە لە چەمو چخوردا دەروێت و بەرمەکەی لە ترێ دەچێت، سپی‌یە بۆ مەبەستی پزیشکی : ئاوبەنگو فێ و ژانە سکو زەردوویی بەکاردێت. |
| كرمبولة - رشدية | Carambola | (کارامبولا) - درەختێکە بەرمەکەی ترشە بۆ شەربەت و مرەبا بەکاردێت. |
| كرمدان - مشان - برواق كاذب | Bastard asphodel = Bog asphodel | گیایەکی دەشتەکی و پزیشکی‌یە لە کۆمەڵەی زەمەق بۆ رازاندنەوە ، گوڵەکەی بچوک و زەردە مادەیەکی ژەهرینی پزیشکی لێ دەردەهێنرێت. |
| كرمانية | Kirman | (کرمانی) ، فەرشێکە لە ناوچەی کرمان لە ئێراندا دروست دەکرێت. |
| كرميلة - -كارامل | Caramel | (کارامێل) ، شەکری سوتاو بۆ رەنگ کردن و تام خۆش کردن بەکاردێت وەکو لە حەڵوای (کرێم کارامێل) دا. |
| كرنب - كرنب - لهانة - ملفوف | Cabbage = kale = Hungarian turnip | کەلەرم ، داشکەلەم ، رووەکێکی کشتوکاڵی‌یە، گەڵاکانی دەوری قەدەکەیان داوە، لەبەر گەڵاکانی ناوەوەی سپین، دەکرێت بە چێشت و زەڵاتەو ترشیات. |
| كرنب - لارويس | Kale | جۆرێکە لە کەلەرم گەڵاکانی پێچراوەنین بەڵکو کراوەن. |
| كرنب لاروّيسي | Cubbage | کەلەرم، کەلەرمی بێ سەلك. |
| كرنب البحر | Sea Cabbage = sea kale | کەلەرمی دەریا ، گشایەکی کشتوکاڵی‌یە لە قەراغی دەریاکاندا دەروێنرێت. ، تامەکەی لە تامی کەلەرم دەچێت،دەکرێت بە چێشت. |
| كرنب لفتي - كرنب شلغمي - كرنب ساقي -كرنب ابو ركبة - كلم | Kale rurnip = kohl rabi = turnip cabbage = swede | کەلەرم، کەرەمشێلمی جۆرێکە لە کەلەرم رەگو قەدەکەی ئەستوورن،واتە سەلکی هەیە وەك شێلم دەخورێت، یان دەکرێت بە ئالیك. |
| كرنبية | Cabbage tree | دار کەلەرم - درەختێکە لە کەڵی قەدەکەی دەرمانێك دەردەهێنرێت بۆ کرم فڕێ دان. |
| كرناف البندقية - كرنافة - قندق | Gun stock | قۆناغە تفەنگ. |
| كرنافة | The butt end of the palm branck | بنکی گەڵای دارخورما. |
| كرنبية | Black veined white | جۆرە مێرووییەکی زیان بەخشە بە رووەك لە پەپوولە دەچێت. |
| كرنتينة - عزل - محجر صحي | Quarantine | قورەنتینە - جیاکردنەوەی نەخۆشی ترسناك لە شوێنی تایبەتیدا. |
| كرنك - مرفق الآلة | Crank | دەسکی ئامراز. |
| كرنوش | Water cress | گووزەڵە (راجع قرە العین) |
| كرنوبة | | راجع (کارنوبا). |
| كرنيتة، كلارنيت | Clarinet | زوڕنا، کلارنێت، قرناتە، ئامرازێکی مۆسیقایە، لە شمشاڵ دەچێت. |
| كرنيت | Kernite | (کێرنایت) یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی بۆرەك بریتی‌یە لە بۆراتی سۆدیۆم، بە شێوەی کریستاڵی رۆشن لە کالیفۆرنیا هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| كوة - روشن - فتحة | Louver = fenestra = small window operture = loophole | كون، بەرگاز، رۆچنە، رۆژەن، كونە باجگە، كۆنۆچكە، دەلاقە، زەرافە، كلاو رۆژنە، پەنجەرە. |
| كوة بيضية | Oval window = fenestra-ovalis | كونە هێلكەیی، دەلاقە هێلكەیی لە ئێسكی ناوەوەی گوێچكەدا. |
| كوة مستديرة | Round- window = fenestra rotunda | كونە خڕە، دەلاقە خڕە، لە ئێسكی ناوەوەی گوێچكەدایە. |
| كوتليون | Cotillion | كۆتیلیۆن، سەمایەكو مۆسیقایەكی فەرەنسییە. |
| كوتيسور | Cotesor | كۆتیسۆر، دەرمانێكە بۆ چارەكردنی پشێویی لە سوری خوێندا بە شێوەی شلەو حەبو دەرزی هەیە. |
| كوث - حف | Slippers | سۆل، جۆرێكە لە پێڵاو. |
| كوثل - فوفل - شاه صيني - تامول - قنبول - تانبول | Betel pepper = pan feaf = Betel palm = Arica palm = piper betle | بێتیل، بیبەری بێتیل، ڕووەكێكە لە كۆمەڵەی بیبەر گەڵاكەی دەجوون. |
| كوثل - مؤخر السفينة | Stern = the oval window = the oval fenestra of the ear | پاشەوەی پاپۆڕ. |
| كوثل | Puppis = stem of the ship Argo | سوكانی (ستێرنی) پاپۆڕی ئەرگۆ، كۆمەڵە ئەستێرەیەكی باشورییە. |
| كوثل - أطماط | Areca = Areca Catechu | درەختێكە لە كۆمەڵەی دارخورما بەرەكەی بۆ مەبەستی دەرمان بەكاردێت. |
| كوجة - اجاص | Greengage | هەڵوژە، حلیك. |
| كوجة برية - اجاص بري | Prunus-Torlussa | هەڵوژە كێویلە . |
| كوجر - بوما - اسد جبلي - فهد امريكي | Puma = Cougar = American lion | كۆجەر یوزی ئەمەریكی ، شێری شاخی، پوما، كۆجەر ، شێری ئەمەریكی، جۆرە گیاندارێكە لە بێڵە شێر دەچێت، نزیكەی (٢) مەتر درێژ دەبێت. |
| كوجرات - كركدية - وردة الصين | Karkade = African mallow = Red sorrel = Rosella = Rama | كوجەرات، ترشۆكەی سوور، ڕووەكێكە گەڵاكەی سوورە دەكرێت بە چای، لە هندستان دەڕوێنرێت. |
| كوخ | Hut = Cot = cottage | زنج،قوخ،قوخنە،كۆختە،كوخیتە،كۆزیت،چاتۆل،كونج،قونجك،پینگ، كولبە. |
| كوخر - سنوت - حزا - شبت - زوفر | Anet = dill | شویت، گیایەكی ساڵانەی بۆنخۆشە وەكوو بەهارات. |
| كود - نيالة - مرامري | Kudo = Koodoo | كوودوو،جۆرێكە لە مانگا كێوی گەورەو سوورە، هێڵی سپی پێوەیە، نێرەكەی دوو شاخی گەورەی مارپێچی هەیە، لە سودان دەژی. |
| كوداك | Kodack | كۆداك،كامێرای دەستی. |
| كودايين - كودئين - كودين | Codeine = Codein = methyl morphine | كۆدایین،مەسیل مۆرفین، مادەیەكی نیمچە قڵیەیی بێ هۆشكەرە، بە شێوەی بلووری یان تۆزی سپی یان بێ ڕەنگ هەیە لە هەوادا شێ وەردەگرێت(یەق دەكاتەوە) ڕووناكی كاری تێ دەكات كەمێك لە ئاودا دەتوێتەوە بەڵام بە باشی لە ئەلكهول و كلۆرۆفۆرمدا دەتوێتەوە لە تلیاك دەردەهێنرێت زۆر بەكارهێنانی دەبێتە هۆی خوو، لە مەیانی پزیشكیدا بۆ دەرمان وەك بۆ دەرمانی كۆكە بەكاردێت، یاسای كیمیای $C_{18}H_{21}NO_3H_2O$. |
| كودري - كدرية | Corduroy | كودرەی ، قوماشێكی لۆكەی قایمی ریشووە دارە. |
| كودشيا | Godetia | (گۆدشیا)، گوڵە ئەتڵەس، جۆرە گوڵێكە. |

| | | |
|---|---|---|
| کودن | Hinny | ئێستر، هێستر، له ئەنجامی پەڕینی ئەسپ له ماکەر پەیدا دەبێت. |
| کودوبار | Codopar | کۆدۆپار. دەرمانی کەمکردنەوەی ئێشوو ئازاری سەرئێشەو دەمار. |
| کور | Forge = hearth | کورە، کیرەه، وەکوو کورەی ئاسنگەر. |
| کوراسو | Curacoo | کوراسۆ، کوراکاو، جۆرێکە لەمەی به توێکڵی پرتەقاڵی ووشکی بۆن خۆش دەکرێت. |
| C.R.D کورایزة | Coryza | قرنەقاز، نەخۆشییەکه وەکو هەڵامەت تووشی باڵنده دەبێت. |
| کورار | Curare = Curari | کواری، جۆره ژەهرێکه، ڕێسینییه لـه ڕووەك دەردەهێـنرێ لـه ناوچـه ئیستیوائیەکاندا ، هیندییـەکانی ئـەمریکای باشـووری تـیری (سهم) پـێ ژەهراوی دەکەن، له مەیانی پزیشکیێدا بۆ خاوکردنەوەی ماسولکه بەکار دەهێنرێت. |
| کوارس | Curassow | کوراسـۆ، باڵندەیـەکی گەورەیـه لـه کۆمەڵـەی مریشـك لـه ئەمـەریکای باشووریدا دەژی. |
| کوربانجیل | Corbangil | کۆربانجیل، دەرمانێکه بۆ چارەکردنی نەخۆشی سنگه کوژی به شێوەی حەب هەیه. |
| کورتاج | Cure Tlage | کورتاج،گولبنك بڕین، کڕاندنی مناڵدان له ئافرەتدا. |
| کورتین | Cortin | کۆرتـین،دەردراوی توێکڵـی لـووی ئـەدرینال چـەند کارکـەرێکی یـان هۆرمۆنێکی چالاکی تیادایه وەکوو کۆرتیزۆن. |
| کورتیزون - کیمیستین | Cortisone = Kemicetine | کۆرتیزون، هۆرمۆنێکـه یـان دەرمانێکـه بـۆ چـارەکردنی ڕۆماتیزمـه یـان نەخۆشی ئەدیسۆن له لایەن توێکڵی لووی ئەدرینالینەوه دەردەدرێت. |
| کورتیزول | Cortisol | کۆرتیزول. |
| کورثل | Patrinia | پاترینیا، گیایەکی دەشتەکیو رازاندنەوەیه بەرەکەی هێلکەیییه. |
| کورجاتوفیوم - رزرفوردیوم | | )راجع کرجاتوفیوم( توخمێکی کانزاییه له ساڵی ١٩٦٨ دا دۆزراوەتەوه. |
| کوردیت | Cordite | کوردایـت، مادەیـەکی تەقەمەنییه تێکـەڵاوه لـه ٥٨٪ نیترۆگلیسـرین، ٣٧٪ لۆکـەی بـاروت،٥٪ لـه هێلمـی مـەعدەنی ، دەکرێتـه بۆمبـاوه لـه شـێوەی پەتك(حبل) دا دروست دەکرێت. |
| کوردلین | Cordyline | کوردیلین، ڕووەکێکـی جوانه گەڵای سەوزو سوری هەیه بـۆ رازاندنـەوەی باخچەکان بەکاردێ. |
| کوردوبة | Cordoba | کۆردۆبا، یەکەی دراو له وڵاتی نیکاراگوا. |
| کورسیة | Corset = stays | سك بەند، کورسێ، بەرگێکه ئافرەت به کاری دەهێنێت بۆ بەستنی کەلەکەو سمت. |
| کوردون - شریط - قردون | Cordon = ribbon | قۆردۆن وەکوو قۆردۆنی سەعات ، شریت. |
| کورل الشمس - بلسون الشمس | Eurypyga | کۆرل، باڵندەیەکه به سەرو ملدا له مرواری دەچێت، به لەشدا له قەلەمون دەچێت ڕەنگینه ، به ڕەنگی زەردو ڕەشو سپیو قاوەییو گەنمیو سپی، چاوی سوره، لاقی زەرده له ئەمەریکای باشوور دەژی. |
| کورمة (کورم) - جعثن | Corm | قەدی ژێر زەوی، کۆرم،بریتییه له قەدی ڕووەك که له ژێر زەویدا دەئاوسێ بۆ هەڵگرتنی خواردەمەنی وه گۆیکەی پێوەیه وەکوو زەعفەران ، سەلکه پیاز. |
| کورنبراش | Cornbrash | کۆرنبراش، چینێکی کلسی دەنکۆڵەداره. |
| کورندم - کوراندم - یاقوت | Corundum | کورەنـدەم، ئەلـەمنیۆم ئۆکسـایدی (ئـەلومینا) بـێ ڕەنگـی ڕوون کـه بـۆ سـافکردنو ڕوشـاندنی کانزاکـان بـەکاردێت، هـەروەها جۆرێکـه لـه یاقوت،یاقوتی سوور. |

| | | |
|---|---|---|
| كورون | Koruna | كۆرۆن، يەكەى دراوى چيكۆسلۆڤاكى. |
| كوروبين | Corubin | كۆرۆبين، ئۆكسيدى ئەلەمنيۆم پاشماوەى ئۆكسيدى ئەلەمنيۆم لە كردارى (تەرميت) دا. |
| كورنتين | Corontin | كۆرۆنتين، دەرمانێكە بۆفراوان كردنى بۆرى خوێنى دڵ بەكاردێت بە شێوەى حەب هەيە. |
| كورول | Curule | كوورووڵ، كورسىيەكى بێ پشتە قەد دەكرێت. |
| كورونيلا | Coronilla = scorpion senna | كۆرۆنيلا، گوڵبەندزكە، گيايەك يان دەوەنێكە لەبەر گوڵە جوانەكەى دەروێنرێت. |
| كوري | Kauri | كاورى، دەرختێكە لە كۆمەڵەى سنەوبەر، زەمقێكى لێ دەردەهێنرێت لە دروست كردنى وەرنيشدا بەكاردێت. |
| كوري | Curie | كورى، يەكەى پێوانەى گورجى چالاكى تيشكدانەوەكە بريتىيە لە شيبوونەوەى (٣ر٧ x $١٠^{١٠}$) گەرديلەى تيشكدەرەوە لە چركەيەكدا. |
| كوريدال | | (راجع قبرية). |
| كوري | | (راجع كلمة كاوري). |
| كوريدالين. | Corydaline | كۆريدالين، مادەيەكى ئەلكانى بلوورى بێ رەنگە لە رەگى رووەكى كۆريدال و كوژڵك دەردەهێنرێت. |
| كوريا - خوريا - زفن - مرض الرقص السنجي - رقص سانت وينس | Chorea St. Vituss dance | كۆريا، پشێوىيەكى دەمارىيە كرژبوون لە دەموچاوو پەلەكاندا پەيدا دەكات. |
| كوريفيا | | جۆرێكە لە دارخورماى رازاندنەوە. |
| كوريوم(cm) | curium | كوريۆم، توخمێكى كيمياگەرىيە كێشى ئەتۆمىيەكەى (٢٤٣) ە ژمارەى ئەتۆمىيەكەى (٩٦)ە، كانزايەكى دەستكردە بەناوى زانايان (بيير مارى كورى). ناونراوە، ئەم توخمە لە ئەنجامى ئەوەوە پەيدا دەبێت كە ئەتۆكەى ئەلفا بگيرێتە توخمى بلوتونيوم. |
| كوريزا - زكام | Coryza | هەڵامەت، ئاوسان و سوتانەوەى پەردەى لووت. |
| كوريزمة | Chorizoma = tango plant | كۆريزۆما، گيايەك يان دەوەنێكى كشتوكاڵىيە بۆ رازاندنەوە. |
| كوز | Jug = Mug = tan kard | گۆزە، شەربە، كولێنە، سەوێل، پەرداخ، جام، گوزەو گلێنە، دەفرێكى لە قورى سوورەوەكراوە بۆ ئاو خواردنەوە. |
| كوز - قادوس | Noira scoop = bucket of water wheel | سەتڵى (پەقرەجى) جەنجەرى ئاو. |
| كوز صغير | | گۆزەڵە، گۆزەڵەى بچوك. |
| كوز قدحي | | سەوێل، پەرداخى گلێنە بۆ ئاو خواردنەوە. |
| كوز العسل -كوسا العسل - شمام العسل | Honey dew melon | كاڵەكى هەنگوينى ، كاڵەكێكە كرۆكەكەى سپى يان مەيلەو سەوزە توێكڵەكەى تەنك و سەوزى مەيلەو زەردە، تامەكەى خۆشە. |
| كوزكندم | | (راجع كلمه جوز جندم) |
| كوز الصنوبر | Pine-cone = strobile | بەرى رووەك كە شێوەيەكى قوچەكى هەبێت وەكوو بەرى سنەوبەر. |
| كوزالذرة | Corncob | بەرى گەنمەشامى، كە شێوەيەكى قوچەكى هەيە. |
| كوزموغرافي - كوزموغرافيا | Cosmography | كۆزمۆگرافى، باسێكى گشتى گەردوونە زانستىيە كە باسى رواڵەت و پێكهاتى گشتى گەردون دەكات زانستىيەكانى ئەستێرەوانى و جيوگرافى و جيۆلۆجى دەگرێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| كوزموغرافي | Cosmographer | كۆزمۆگرافەر، گەردوون زان، زانا لە گەردووندا. |
| كوزمولوجي | Cosmologist | كۆزمۆلۆجیست، زانا لە مۆلۆجیدا. |
| كوزمولوجي - علم الكونيات | Cosmology | زانستی گەردون، لقێکە لە زانستی ئەستێرە شوناسی ، باسی بنەرەت و پێکهات و یاساکانی گەردون دەکات. |
| كوزموس - كوزميا - قسموس | Cosmos | كۆزمۆز، رووەکێکە گوڵی جوان دەگرێت. |
| كوزموترون - بيفاترون | Cosmotron | كۆزمۆترۆن، دەزگایەکە بۆ زۆر خێراکردنی پرۆتۆنەکان، بەمەش ئەو پرۆتۆنانە وزەیەکی ئەوتۆ پەیدا دەکەن کە لە ملیۆن ئەلیکترۆن فۆڵت زیاتر بێت. |
| كوزن | Doe | مێی فیلەکێژەو ئاسك، گە وەزنی مێ. |
| كوس - مثلث الرسم | Set sqare | سێ گۆشەی هێڵکێشان. |
| كوسا - كوسة - كوسي | Pumpkin = Vegetablemarrow | کولەکەی درێژکۆلە، رووەکێکی کشتوکاڵییە بەرەکەی لە خەیار دەچێت دەکرێت بە چێشت. |
| كوس النجار | Bavel | گۆنیا، گۆشەپێو. |
| كوسا الفرنجي - سكيوم | Chayote | چایۆت، کولەکەی ئەفرەنجی. |
| كوسج - قرش - كلب البحر | Shark = sturgen = sturgon | کۆسە، سەگەماسی(گوانو) سەگی دەریا، جۆرە ماسییەکە درندەیە ددانی وەك مشار وایە،گیانداری تری پێ لەت دەکات. |
| كوسي | | ولاخی پەل کورت. |
| كوسيت - سليكا كثيفة | Coesite | کۆیسایت،سلیکای پتەو. |
| كوش - ناردين سنبلي | Plough mans spike nard | گیایەکی دەشتەکییە گەڵاکەی توکنە گوڵەکەی سپی یان ئەرخەوانی یان بنەوشەیی یان زەرد یان شینە، مادەیەکی ژەهری لێ دەردەهێنرێ بۆ قەڵاچۆکردنی مێروو ، جاران عەتر لە رەگەکەی دەردەهێنرا. |
| كوش - اسفاد - تراصع | To couple | بەسەراتسین، جوت گرتن، بە تایبەتی لە باڵندەدا. |
| كوشاد - جنطيانا | Gentian | گوشاد، رووەکێکی دەشتەکی و کشتوکاڵی و رازاندنەوەیەو پزیشکییە، لە رەگەکەی مادەیەکی تاڵ و مادەیەکی ترش و جۆرە رەنگێك دەردەهێنرێت، هەروەها لە رەگی هەندێکیان جۆرە شەکرێك دەردەهێنرێت. |
| كوشة - متكا | Couch | قەنەفە، قەرەوێڵە. |
| كوشنيل - قملة النبات | Cochineal | (راجع كلمه قرمزيه). |
| كوشية - هيشم | Kochia | گیایەکی گەڵا سەوزە لە پاییزدا. سور دەبێت گوڵەکەی وردە. |
| كوشية - مكنسية - ورد المكانس | Kochia | گوڵە گەسك. |
| كوع | Radius | چومرگە، چومشکە، پاژنەی لەپ، ئێسقانێکە لە باسکدا، لە پەنجە گەورەوە نزیکە. |
| كوع | Bend = sqruare-elbow | قۆڵی ئاودەست، ئامرازێکی تایبەتییە دەخرێتە ئاودەستەوە نایەڵێ گازی بۆگەن بێتە دەرەوە. |
| كوفية | Cigar flower = cuphea | کوفیا، رووەکی جگەرە، گیایەکە گوڵی گەورەی بنەوشەی دەگرێت رووەکێکی مەکسیکییە پەرەی گوڵەکەی لە جگەرە دەچێت. |
| كوفية | Silk head wrapper | چەفێ، چەفتە، سەرپۆش. |
| كوفينيت | Coffinite | کوفینایت، مەعدەنێکی یورانیومی سروشتییە رەنگەکەی رەشە، کێشی جۆرییەکەی (١و٥) بریسکەکەی ئەڵماسییە، دەنکۆڵەی ووردی تیایە، لەگەڵ مادەی ئەندامی و کانزلکانی تردا بە تێکەڵاویی هەیە، لە ناوچەی کلۆرادۆ یوتاو ئەریزۆنادا هەیە، کەرەستەیەکی خاوی یۆرانیۆمە، یاسای کیمیای: $U\,(sio_4)_{1-x}\,(oH)_{4x}$ . |

| | | |
|---|---|---|
| كوفيراين - تريكونيلين | Coffeariine = trigonelline | كۆفيراين، تريگۆنيلين، مادەيەكى تفتە لە تۆوى زۆربەى رووەكەكاندا. پەيدا دەبێت، بە شێوەى پوازكى بێ رەنگ هەيە لە ئاوو ئەلكهولدا دەتوێتەوە ، لە تۆوى رووەكەو دەنكى قاوە دەردەهێنرێت لە لێكۆڵینەوەى بايۆكيميابيدا بەكاردێت. |
| كوفيليت | Covellite = indigo Copper = Covelline | كۆفيليت، يەكێكە لە كەرەسە خاوەكانى مس بە شێوەى گۆگردیدى مس رەنگەكەى چويتى‌يە. |
| كوكا - كوكة | Coca = Spadic busch | كۆكا، دەوەنێكە قەدەكەى سپى‌يە گوڵەكەى وردەو زەردە، بەرەكەى سورە، گەڵاكـەى دواى ووشـك كردنـەوە مادەيـەكى ئەلكالـى سـڕكەرى لـێ دەردەهێنرێت پێى دەوترێت(كۆكايين). |
| كوكاتوو - ككتوة | Cockatoo | كۆكاتوو، جۆرێكە لە تووتى زۆر جوانە، دەتوانێت پۆپنەكەى بەرزو نزم بكاتەوە ، لە ناوچە گەرمو نيمچە گەرمەكاندا دەژى بەرو تۆوى درەخت دەخوات، توانايى ئەوەى هەيە كە لەسەر قاچێك بوەستێت و خواردەمەنى بە قاچەكەى ترى بگرێت، تواناى قسەكردنى هەيە. |
| كوكائين - كوكايين | CoCaine | كۆكاين، مادەيەكى نيمچە ئەلكالى‌يە، بە شێوەى بلورى بێ رەنگ يان سپى هەيە، يان بە شێوەى تۆزێكى سپى هەيە،كەمێك لە ئاودا دەتوێتەوە بەڵام لە ئەلكهول‌وئيثە رو كلۆرو فۆرمدا دەتوێتەوە ، ئاوێتەيەكە لە كاربۆن‌و ئۆكسجين‌و هيدروجين‌و نتروجين پێكهاتووە لە گەڵاى رووەكى كۆكا دەردەهێنرێ، بۆ بێهۆش كردن‌و سڕكردن بەكار دەهێنرێ چونكە كار دەكاتە سەر مێشك‌و دەبێتە هۆى گێژى‌و لەرزو ئيفليجى ، بەنگ كێشەكان حەزى لێ دەكەن، لە ناوچە گەرمەكانى ئەمريكاى باشوريدا هەيە ياساى كيميايى: $C_{17}H_{21}NO_4$. |
| كوكايينية - ادمان الكوكايين | Cocainism | كۆكاينێتى، خووگرتن بە بەكارهێنانى مادەى كۆكايينى بێ هۆش كەرەوە. |
| كوكابورا | KooKaburra | كۆكابۆرا، باڵندەيەكى ئوستورالى گەورەيە پێى دەوترێت (كەرى پێكەنين) چونكە خوێندنەكەى لە پێكەنين دەچێت. |
| كوب ثابت - نجم | Star | ئەستێرە، ئەستێرەى بێ روناكى تەنێكى ئاسمانى ساردى تاريكە بە دەورى خۆيدا دەسورێتەوە خۆى روناكى نيە بەڵام روناكى خۆر رەت دەكاتەوە. |
| كوكب سيار | Planet | پلانێت، هەسارە ئەستێرەى گەڕۆك، ئەستێرەى كاروان كەر، هەر ئەستێرەيەك كە بە دەورى خۆردا بسوڕێتەوە لەسەر سوڕگەيەكى تايبەتى. |
| كوكبان - بلانيتاريوم | Planetarium | پلانيتاريوم (١) دەزگايەكە جوڵەكانى خۆرو مانگ‌و ئەستێرەو هەسارەكان پيشان دەدات بە ئاراستەكردنى رووناكى بۆ ناو گومەزێك.(٢) ئەو گومەزەى يان بينايەى كە ئەو دەزگايەى تيادايە. |
| كوكبة - صورة سماوية | Constellation | كۆئەستێرە، كۆمەڵە ئەستێرەيەكى نەگەڕۆكە، شێوەيەكى سەيرى هەيە. |
| كوكبة الزرافة | Camelopard | كۆ ئەستێرەى ووشتر بەڵەك. |
| كوكبة الحمل (برج) | Aries | كۆ ئەستێرەى بەرخ. |
| كوكبة السهم | Sagitta | كۆ ئەستێرەى تير. |
| كوكبة الذئب | Lupus | كۆ ئەستێرەى گورگ. |
| كوكبة القيثارة - شلياق | Lyra | كۆ ئەستێرەى گيتار. |
| كوكبة الرامي (برج) - كوكبة القوس | Sagittarius | كۆ ئەستێرەى تير ئەنداز. |
| كوكبة السرطان(برج) | Cancer | كۆ ئەستێرەى قرژاڵ. |

| | | |
|---|---|---|
| كوكبة قنطروس | Centaurus | کۆ ئەستێرەی سینتاورەس. |
| كوكبة النهر - كوكبة النهر الظيم | Eridanus | کۆ ئەستێرەی رووبار. |
| كوكبة العذراء | Virgo | کۆ ئەستێرەی کەنیشك. |
| كوكبة الشراع | Vela | کۆ ئەستێرەی چارۆکە. |
| كوكبة الدجاجة | Cygnus | کۆ ئەستێرەی مریشك. |
| كوكبة العقرب(برج) | Scorpius | کۆ ئەستێرەی دووپشك. |
| كوكبة المثلث | Triangulum | کۆ ئەستێرەی سێ گۆشە. |
| كوكبة الثور(برج) | Taurus | کۆ ئەستێرەی گا. |
| كوكبة - صورة سماوية | Constellation | کۆ ئەستێرە، کۆمەڵە ئەستێرە کۆمەڵە ئەستێرەیەکی ئەگەرۆکە شێوەیەکی سەیری هەبێت وەکوو شێوەی گیانەوەرەکان. |
| كوكبة العقاب - لو النسر الطائر | Aquilla = Aquila = eagle | کەلوی دال، کۆمەڵە ئەستێرەی دال. |
| كوكبة الأكليل الجنوبي | Corona Australis | کۆمەڵە ئەستێرەی گوڵبەندی باشووری. |
| كوكبة الحارس لو الراعي | Bootes = Bootis | کۆمەڵە ئەستێرەی پاسەوان یان شوان. |
| كوكبةالحمامة | Columba | کۆمەڵە ئەستێرەی کۆتر. |
| كوكبة الكلب الأكبر | Great dog = canis major | کۆمەڵە ئەستێرەی سەگە گەورە. |
| كوكبة الباطية(الكاس). | Crater | کۆمەڵە ئەستێرەی جام، کۆمەڵە ئەستێرەی کاسە. |
| كوكبة الكلب الأصغر | Canis minor | کۆمەڵە ئەستێرەی سەگە بچکۆلە. |
| كوكبة الجاثي | Her cules | کۆمەڵە ئەستێرەی هەرقل. |
| كوكبة الأكليل الشمالي | Corona borealis | کۆمەڵە ئەستێرەی گوڵبەندی باکور. |
| كوكبة قيفاوس لو الملتهب | Cepheu | کۆمەڵە ئەستێرەی پرتەکەر یان گرگرتوو یان سیفوس. |
| كوكبة الصليب الشمالي | Cross borealis | کۆمەڵە ئەستێرەی خاچی باکووری. |
| كوكبة الأوزة | Lyra = harp | کۆمەڵە ئەستێرەی قاز. |
| كوكبة الصليب الجنوبي | Cross australis | کۆمەڵە ئەستێرەی خاچی باشووری. |
| كوكبة الحواء | Ophiuchus | کۆمەڵە ئەستێرەی حەوا. |
| كوكبةالتنين | Dragon = draco | کۆمەڵە ئەستێرەی ئەژدیها. |
| كوكبة الجبار | Orion | کۆمەڵە ئەستێرەی مەزن. |
| كوكبة القيطس | Cetus | کۆمەڵە ئەستێرەی نەهەنگ. |
| كوكبة الدلفين | Delphinus | کۆمەڵە ئەستێررەی دەلفین، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی بچوکی باکورییە. |
| كوكبة النسر الواقع | Lyra | کۆمەڵە ئەستێرەی سیسارکی کەوتوو. |
| كوكبة الدب الأكبر - نبات نعش الكبرى | Great Bear = ursa Major = Cynosure | کۆمەڵە ئەستێرەی حەوتەوانەی گەورە یا وورچە گەورە ، چەند ئەستێرەیەکی ئەگەرۆکە لە بورجی وورچی گەورە. |
| كوكبة الدب الأصغر = نبات نعش الصغرى | Ursa minor | کۆمەڵە ئەستێرەی حەوتەوانەی بچوك یا ورچە بچکۆلە. |
| كوكبة الفرس الأعظم - كوكبة البراق. | Pegasus | کۆ ئەستێرەی بوراق، کۆ ئەستێرەی ئەسپی مەزن، کۆ ئەستێرەی ئەسپی باڵدار. |
| كوكبة الجوزاء - كوكبة التوامان(برج) | Gemini | کۆنە ئەستێرەی کەشکەشان، کۆ ئەستێرەی دوو جمگە. |

| | | |
|---|---|---|
| كوكبة الاسد(برج) | Leo | كۆ ئەستێرەی شێر(بورجێكە). |
| كوكبة الأرنب | Lepus | كۆ ئەستێرەی كەروێشك. |
| كوكبة ذات الكرسي | Cassiopia = Cassiopea | كۆ ئەستێرەی كورسی دار. |
| كوكبة الميزان | Libra | كۆ ئەستێرەی تەرازوو(بورجێكە). |
| كوكبة الجدي | Capircorn | كۆ ئەستێرەی كارژۆلە. |
| كوكبة الحوت(برج) | Piscis | كۆ ئەستێرەی نەهەنگ. |
| كوكبة مفرغة الهواء | Antlia | كۆ ئەستێرەی باكەش. |
| كوكبة السفينة | Argo | كۆ ئەستێرەی پاپۆر. |
| كوكبة الأكليل الجنوبي | Corona-ausralis | كۆ ئەستێرەی گوڵبەندی باشووری. |
| كوكبة الدلو (برج) | Aquarius | كۆ ئەستێرەی دۆلكە. |
| كوكبة نجمية (برج) | Costellation | كۆمەڵە ئەستێرەیەكی جێگیر كە لە شێوەی گیاندار یان شتی تردا دەبینرێت وەكوو كۆمەڵەی ئەستێرەی ورچ یا هەرقل یا كەوانە هتد |
| كوكبة الورل = كوكبة العظاءة | Lacerta | كۆ ئەستێرەی بزن مژ(مارمێلكە). |
| كوكبة كلاب الصيد | The hunting dogs = canes Venatici | كۆ ئەستێرەی سەگی راو كۆمەڵە ئەستێرەیەكی نەگەڕۆكە لە بورجی سەگی راوی. |
| كوكبة وحيد القرن = كوكبة الكركدن . | Unicorn | ئەستێرەیەكی نەگەڕۆكە لە بورجی (یەك شاخە) واتە لە بورجی كەركەدەن. |
| كوكبة السبع اوالذئب | Lupus | كۆمەڵە ئەستێرەی شێر یان گورگ. |
| كوكبة فرساوس | Perseus | كۆ ئەستێرەی پێر سیوەس، بەناوی قارەمانێكی گریكیەوە. |
| كوكبة عملاقة | Giant stars = giant planets | كۆ ئەستێرە چەتەوڵەكان هەسارە چەتەوڵەكان وەكو (مشتەری ، زوحەل، ئورانۆس، نیبتۆن). |
| كوكب البحر = نجم البحر | Asterias = star fish | ئەستێرەی دەریا، گیاندارێكی دەریایی پێست دركاوییە، لەشەكەی بریتییە لە خەپلەیەكی (قرص) ناوەندیی واتە چەقی پێنج پەلی پێوەیە، گیاندارە نەرمۆڵەكان دەخوات. |
| كوكبية | Astrantia | ئەسترانتیا، دەوەنێكە گوڵەكەی لە ئەستێرە دەچێت بە رەنگی سپی یان پەمەیی، رەگەكەی دەرمانی رەوانی لێ دەردەهێنرێت. |
| كوك الله | Salt wort = salicornia | ئەسپۆن، دادەیەكی قلیەییە لە هەندێك رووەك دەردەهێنرێت بۆ جل شتن و دروست كردنی شووشە. |
| كوكة | Coca | كۆكا، درەختێكە كۆكایینی لێ دەردەهێنرێت. |
| كوكتيل مولوتوف | Molotov cocktail | كۆكێلی مۆلۆتۆف، بۆمبایەكی دەستییە بریتییە لە شووشەیەك پڕە لە شلەیەكی گڕ گرتوو. |
| كوكتيل ذري | Atomic cocktail | كۆكتێلی ئەتۆمی، مادەیەكی تیشك دەرەوەیە بە شێوەی دەرمانێك لە دەمەوە دەدرێت بەو كەسەی تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بوە. |
| كۆكسيد الدواجن | Coccidiosis | كۆكسیدیۆسیس، كۆكسیدیا، نەخۆشییەكی درمی ترسناكە توشی باڵندە دەبێت وەك مریشك، پیسایەكەی خوێناوی دەبێت دەدات لە جگەرو ریخۆڵەی باڵندەكە بە هۆی گیاندارە سپۆرییەكانەوە دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| كوك، فحم الكوك | Coke | كۆك، خەڵووزی كۆك، بریتی‌یە لە پاشماوەی كرداری دڵۆپاندنی لەناوبردنی خەڵوزی قیریی یان پەترۆڵ، مادەیەكی كاربۆنی‌یە، جۆرە سەرەكی‌یەكەی ئەوە كە لە گەرم كردنی خەڵوزی قیری لەناو كورەی كۆكدا گەرم دەكرێت، یەك تەن لە خەڵوزەكە ٧و٠ تەن كۆك دەدات، لە ئامادەكردنی كەرەسەی خاوی ئاسن‌وگازی دەست كردا بەكار دێت، هەروەها لە ئامادەكردنی ئەلەمنیوم‌و فۆسفۆرو كاربیدی كالسیوم‌و سلیكۆندا بەكاردێت. |
| كوكل | Cockle | (كۆكل) گیاندارێكی نەرمۆڵەیە دوو لەپكەی هەیە لە شێوەی دڵ دان. |
| كوكونيز | CoCoonese | كۆكۆنیز، ئەنزیمێكی شیكەرەوەی پرۆتینی‌یە. لە مۆرانەی ئاوریشم دەردەهێنرێت لە ئەنزیمی تریپسین دەچێت. |
| كوكيا - ورد المكانس - كوشية مكنسية | Summer cypress = koehia = mock cypress | كوشیای گەسكی ، گوڵە گەسك ، گیا گەسك. |
| كول | Lazy | تەمەڵ. |
| كولا= جوزة الكولا - بذور الكولا - قهوة سودان | Cola = kola = muts = seeds = soudan = guru | كۆلا ، گوێزی كۆلا، تۆوی كۆلا ، قاوەی سودان ، گوورو ، ئاوێكی گازی‌یە دەخورێتەوە، مادەی كافائین‌و ثیوبرۆمینی تیادایە لە خۆر ئاوای ئەفەریقاو خۆرئاوای ئەندیزو هیندستاندا هەیە، شەربەتی سوكەڵەی لێ دروست دەكرێت. |
| كولاجين | Collagen | كۆلاجین، پرۆتینێكی ریشاڵی‌یە زۆربەی ریشاڵی سپی لە شانە بەستەرەكانی لەشی گیاندارو مرۆڤ پێك دەهێنرێت بە تایبەتی لە پێستداو ماسولكەو ژێیەكاندا بڵاوترینی پرۆتینە لە جیهانی گیانداراندا.، ئەو سرێشەی كە لە پێستەی گیاندار دروست دەكرێت هەتا ئێستاش وەكو مادەیەكی لكێنەر بەكاردێت، جۆری تایبەتی لە كۆلاجین هەیە كە لە دروست كردنی دەرمانی ئارایشتدا وەكو كرمێكی دەم‌و چاوو بۆ قژ بەكار دەهێنرێت هەروەها لەمەیانی دەرمان سازیداو هەروەها كۆلاجین دەكرێت بە جەلاتین. |
| كولان - بردي | Papyrus | بەردی ، تەركەی ئاویی، جۆرە روەكێكی ئاوی‌یە، لە قامیش دەچێت. |
| كولان - كاولين | Kaolin = porcelain clay | كائۆلین ، ئەو قورە سورەی كە گلێنەو فەخفوری لێ دروست دەكرێت. |
| كولان | American partridges | سوێسكەی ئەمەریكی ،باڵندەیەكە لە سوێسكە دەچێت دەنوكی چەماوەیە، باڵی خڕو كورتە، رەنگینە بە رەنگی سپی‌و زەردو خۆڵەمێشی‌و سوورو شین و رەش هەندێكیان سەری پانەو پەڕی پێوەیە. |
| كولارجول | Collargol | كۆلارگۆل ، مادەیەكی قاوەیی‌یە لە ٩٣٪ زیبوی تیادایە، گیرایەكی مڵ لە ئاودا پەیدا دەكات ، هەروەها ناوێكی بازرگانی بۆ زیبوی دڵ. |
| كولاكانث | Coela canth | (كۆیلاكانس)، جۆرەماسی‌یەكی دێرینە. |
| كولة - كولا | Cola nut tree = kola nut-tree | كۆلا درەختێكی ناوچە گەرمەكانە بەرەكەی پێ‌ی دەوترێت گوێزی كولا، مادەیەكی وریاكەرەوەی لێ دەردەهێنرێت. بۆ دڵ‌و ماسولكە، بەرەكەی (٢-١٠)بادەمی گورچیلەیی وشكی سوری مەیلەو سپی یا زەردی تیایە دەخورێت. |
| كولدن | Coldin | كۆڵدن ، دەرمانی ئەنفلۆنزاو تاو هەڵامەت بە شێوەی دەرزی هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| کولستین | Colistin | کولیستین، دەرمانێکە دژی میکرۆب بەکاردێت بەشێوەی دەرزی هەیە. |
| کولب | Choloepus | (کۆلۆپیەس) گیاندارێکە لە کۆمەڵەی تەمەڵ (کسلان) تیسکنە ڕەنگەکەی قاوەییە لەسەر درەخت دەژی. |
| کولشیسین - سورنجین - کولودیوید | Colchicine ($C_{22}H_{25}NO_6$) | کۆلچیسین ، مادەیەکی ئەلکالی کریستاڵیە لە ڕووەکی سورنجان دەردەهێنرێت، لە ئاوو ئەلکهولدا دەتوێتەوە، بە شێوەی تۆز یان بلووری زەرد هەیە ، بێ بۆنە زۆر ژەهرینە، خواردنی ٢٠و٠ گرام دەبێتە هۆی مردن لە دەرمان سازیدا بەکاردێت. |
| کولکانت | Colcannan | کۆلکانۆن، جۆرێکە لە خواردەمەنی لە پەتاتەو کەلەرم دروستدەکرێت. |
| کولبمیت - نیوبیت = تنتالایت | Columbite = niobite = tantalite $[(T_aC_e)_2O_6]$ | کۆلەمبایت ، نیوبایت، تانتلایت، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی نایۆبیۆم تەنتالیۆمو ئاسنو مەنگەنیزی تیادایە لە مەدەغەشقەر هەیە ڕەنگەکەی ڕەشە. |
| کولمبیا | Columbia | کۆلەمبیا، ناوە بازرگانییەکەی کاربۆنی چالاك کراو، بە شێوەی خڕۆكو دەنکۆڵە هەیە، لە ٥و٠ ٦٪ خۆڵەمێش دەدات، لە پاڵاوتنی گازو دەمامکی گازدا بەکاردێت. |
| کولنز | Collins | کۆلینز، جۆرێکە لە مەی وەکوو بەفر بەستوویەتی. |
| کولنکیما - نسیج غروي | Collechyma | کۆلینکیما، شانەیەکە ( ئەتەمێکە) لە چەند خانەیەکی درێژکۆلەی دیوار ئەستور لە سوچەکانی لەشی ڕوەکە باڵاکاندا. |
| کولومبیوم(cb) - نیوبیوم | Columbium | کولومبیوم، نایۆبیوم (Nb) کانزایەکە ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٤١) کێشی ئەتۆمییەکەی (٩٣) ڕەنگەکەی زیوییە، لە دارشتەی هەمەجۆرەدا بەکاردێت. |
| کولونیا - قولونیا | Cologne | قۆلۆنیا ، قۆڵەنیا ، بۆنێکی خۆشە بە زۆری دوای ریش تاشین بەکاردێت. |
| کولوني | Colonic | کۆلۆنی، هەرشتێك پەیوەندی بە ریخۆڵەی کۆلۆنەوە (ریخۆڵە ئەستورە) هەبێت. |
| کولومتر - فولتامتر | Coulometer = Voltameter | کۆلۆمەتر ، ڤۆلتامەتر، دەزگایەکی شوشەییان کانزاییە، بۆ شیکردنەوەی ئاو ، بە تەوژمی کارەبا بۆ ئۆکسجینو هایدرۆجین. |
| کولومب = کولوم | Coulomb | کۆلۆمب ، کۆلۆم، یەکەی پێوانەی بڕی کارەبایەکە تێپەڕ دەبێ لە ماوەی چرکەیەکدا بە گەیێنەرێکدا (موصل) کە بەرهەڵستییەکەی یەك (ئۆم) بێتو ئەرکی کارەباییەکەی یەك ڤۆڵت بێت هەر (٩٦٥٠٠) کۆلۆم دەکاتە یەك فارادی. |
| کولودیون | Collodn | کۆلۆدیون ، بریتییە لە گیراوەی نیترۆ سلیلۆز لە ئیثە رو ئەلکهولدا، شلەیەکی بێ ڕەنگو لینجە لە لۆکە دروست دەکرێت ، بۆ نەشتەرگەری بەکار دەهێنرێت، چونکە پەردەیەکی ڕۆنی دژی ئاو بەجێ دەهێڵێ لەسەر برین. |
| کولوت | Culottes | کۆلۆتس، جلێکی ژنانەیە بریتییە لە تەنورەیەك لە شێوەی پانتۆڵدا دوورراوە. |
| کولي | Cooly = Coolie | کرێکاری (حەماڵی) ئەشارەزا. |
| کولي | Coly | (کۆلی) کۆمەڵە باڵندەیەکە لە ناوەڕاستی ئەفەریقادا دەژی. |
| کولي - جدول | Coulee | جۆگە ، ڕووبارێکی بچووك، شیوێکی لێژ. |
| کولي | Collie | کۆلی ، سەگێکی سکوتلەندی کەتەیە، بۆ پاسەوانی مەڕو ماڵات بەکاردێت. |
| کولیسنثین | Colocyn thin | کولوسینثین، مادەیەکی تاڵە لە کوژاڵکدا هەیە. |
| کولینجیت (فوسجین) | Collingate phosgene | کولینجیت، فۆسجین، گازێکی ژەهرینە لە کارلێکی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆنو گازی کلۆر پێك هاتووە. |

| | | |
|---|---|---|
| کولین | Choline | کۆلین، مادەیەکی شلی تفتە لە ڤیتامین (ب) دا هەیە، یەکێکە لە پێکهێنەرە سەرەکی‌یەکانی چەوری‌یەکان بە تایبەتی لە جگەردا هەیە، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی‌یەکانی جگەر بەکار دەهێنرێت، لە زەردێنەی هێلکەو گورچیلەو جگەر و دڵو دانەوێڵەو سەوزەدا هەیە، لە هەموو خانەکانی لەشدا هەیە. |
| کولیس کوالیس | Slips- of slage | پەردەی شانۆ. |
| کولیرا - هبفة - الهواء الأصفر | Cholera | کۆلێرا ، رەشە ، رشانەوە، چاوەقوڵێ نەخۆشی‌یەکە لە گەدەو ریخۆڵەدا دەبێت رشانەوەو ژانە سكو سك چونی لەگەڵدایە. |
| کولیماتور - میزاء - مسددة | Collimator | کۆلیماتۆر، ئامرازێکە بۆ پەیداکردنی تیشکی تەریبی وەکو تیشکی رووناکی، واتە ئاراستەکردنی تیشك. |
| کولیمنیت | Colemanite | کۆلیمانایت،یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی توخمی بۆرۆن بریتی‌یە لە بۆراتی کالیسیوم کێشی جۆری ٢٦و٢ ٤٨و٢ هەندێك جار لە جیاتی ترشی بۆریك لە دروست کردنی ریشاڵی شووشەدا بەکاردێت لە تورکیا دەردەهێنرێت لە ساڵی (١٩٦٥) وە بە بڕی زۆر دەنێرێت بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو بەربەرەکانی ئەو ($B_2O_3$) دەکات کە لەو ناوچەیەدا لە مەعدەنی کێرنایت (kernite) دەهێنرێتە بەرهەم یاسای کیمیایی $Ca_2B_6 5H_2o$ بێ رەنگ ، سپی یان خۆڵەمێشی‌یە. |
| کولیستمیة | Cholesteremia | کولیستریمیا، زۆربوونی کۆلسترۆلی خوێن. |
| کولینسك | Kolinsky | کۆلینسکی، گیانداری بانبانکەی (نمس) مشکی خورمای ئاسیایی. |
| کولیوس | Flamenettle = coleus | کۆلیۆس ، گوڵەکاڵا، رووەکێکە گەڵای زۆر جوانی هەیە بە رەنگی قاوەیی‌و ئەرخەوانی یان سەوزو رەش‌و سوورن یان زەردو قاوەیی‌و سەوز بۆ رازاندنەوەی ناوماڵ بەکاردێت. |
| کولیسترول | Cholesterol ($C_{27}H_{54}oH$) | کۆلیستیرۆڵ ، مادەیەکی سپی رەقی کریستاڵی‌یە، لە چەوریدا دەتوێتەوە، لە شانەی دەماری‌و زراو خوێن‌و پرۆڤیتامین (D3)و زەردێنەی هێلکەدا هەیە بەردی زراوی لێ دروس دەبێت، پزیشکەکان لەو باوەڕەدان کە بەرزبوونەوەی رێژەکەی دەبێتە هۆی رەق بوونی خوێنبەرو بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن. |
| کولیرا الدجاج هبضة الطیر | Cholera of poulty = chicken cholera = fowl cholera | رشانەوەی مریشك ، کۆلێرای مریشك.نەخۆشی‌یەکی درمی ترسناکە ، توشی باڵندە دەبێت، وەکوو مریشك و کۆترو قازو مراوی ، لوتی ئاو دەکات‌و ریقنەکەی شلەیەکی زەردی یان مەیلەو سەوزە یان خوێناوی بێت. |
| کومباین | Combine | مەکینەی دروێنەو گێرەکردن. |
| کومبوت | Compote | کۆمپۆت، میوەیەکە لە شەکردا کوڵێنرابێت. بە رێگەیەکی ئەوتۆ کە شێوەکەی پارێزراوبێت. |
| کومبرادور | Comprador | کۆمپرادۆر، راوێژکار. |
| کومة - کؤم - رکم | Heap = pile | کەڵەك ، بەستەك، کۆمەڵە. |
| کومة حرارية - ترموبیل | Thermopile | ثێرموپیل ، ئامرازێکە راستەوخۆ ووزەی گەرمی دەگۆڕێت بۆ ووزەی کارەبایی. |
| کومة قش | Haycock | کۆمەڵە کا ، خەرمانەکا. |
| کومة الحبوب | Heap of wheat | جێز ، کۆمەڵە گەنم. |
| کومرونة - سرابية | Tonka bean tree = coumar oune | کۆمارۆنا، درەختێکی گەورە بەرەکەی لە شەمامە دەچێت بە ریشاڵ داپۆشراوە، رەنگەکەی قاوەیی‌یە، کاکڵەی وشك‌و زەردە. لە تۆوەکەی عەتری (کۆمارین) دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| کومارین | Coumarin | کۆمارین، مادەیەکی سپی کریستاڵی بۆن خۆشە لە درەختی (کۆمارۆنا) دەردەهێنرێت، دەکرێتە جگەرەوە بۆنی خۆش دەکات، واتە لە دروست کردنی عەتردا بەکاردێت. |
| کومرون - کومارون | Coumarone | کۆمارۆن، ئاوێتەیەکە لە دروست کردنی وەرنیش و مەرەکەبی چاپدا بەکاردێت. |
| کومل | Kiimmel | کیمیل، جۆرێکە لە مەی. |
| کومن | Commun | کۆمەن، کەروێشکی ئەورووپی. |
| کومودینو | Bedside table | کۆمودین ، مێزێکی بچووکە لە ژووری نوستندا شتوومەکی لەسەر دادەنرێت. |
| کومیس - قمز | Koumiss = kumiss | کۆمیس ، جۆرێکە لە مەی یان شەربەتێکە لە شیری وڵاخ دروست دەکرێت لە لایەن هۆزەکانی ناوەرستی ئاسیادا بەکار دەهێنرێ. |
| کومیسیون - عمولة - سمسرة | Commission | قومیسیون ، دەلالی. |
| کومیدیا - ملهاة | Comedy | کۆمێدی، شانۆگەرییەك بە پێکەنینەوە. |
| کومیدي - هزلي | Comedic | هەرشتێك پەیوەندی بە پێکەنینەوە هەبێت. |
| کون | Cosmos = universe | گەردون، خوستان، ئەو تەنانەی کە جیهانیان لێ پێکهاتووە، زۆربەی گەردوون لە بلیونێك گالاکسی پێك هاتووەو هەر گالاکسییەك لە (٢٠٠ ٥٠٠) بلیون ئەستێرەیە، تەمەنی گەردوون بە (٦-٢٠) بلیون ساڵ مەزەندە دەکرێت. |
| کون متمدد | Expanding universe | گەردونی کشاو، تیوری یەکە دەقەکەی دەڵێت: گالاکسییەکان (مجرات) هەمیشەو بە خێراییەکی زۆر لە یەکتری و لە خڕۆکی زەوی دوور دەکەونەوە. |
| کونتور - خط المناسیب | Contour | (کۆنتۆر) ئەو هێڵەی کە نیشانە تۆلۆگرافی یەکانی ناوچەیەك لەسەر نەخشە (خریطة) یان نموونەی خڕۆکی زەوی پیشان دەدات. |
| کونت - لقب شرف - نبیل اوروبي | Count | کۆنت، گەورە پیاوی ئەورووپی. |
| کونتیسة - نبیلة اوروبیة | Countess | کۆنتیست ، نازناوی ژنی کۆنت. |
| کونج | Hobby | هەلەکە ، تورمتە، جۆرە هەڵۆیەکی بەڵەکە پێ دەگرێت چۆلەکەو مێرو دەخوات. |
| کونجلومیرات - مد ملکات | Conglo merate | کۆنگلۆ میرات، کەڤرە تێکەڵە ، کەڤرە ترخێنە، کەڤرێکە لە پارچەی هەمەجۆری (هەمە سەرچاوەی) تۆپەڵ بووی وەکوو لەو زیخ و چەو پێك هاتووە. |
| کونجیولین | Conchiulin | کۆنچیۆلین، مادەیەکی سروشتی بەستەرە لە پێکهاتی کاربۆناتی کالسیۆمی مرواریدا. |
| کوندور - کندر | Condor | کۆندۆر ، جۆرە سیسارکێکی گەورەیە. |
| کوند کتور - موصل | Conductor | گەیێنەری هێزی کارەباو گەرمی. |
| کوندریت | Chondrite | کۆندرایت، بەردێکە لە ئەستێرەی کشاوەوە دەکەوێتە خوارەوە، شووشە، کەمێك ئاسن و نیکلی تێدایە. |
| کونزیت | Kunzite = spodumene = triphane | کونزایت ، سپۆدیومین ، ترایفێن، بەردێکی بە نرخە بریتییە لە سلیکاتی ئەلەمنیۆم و لیثومی لە بەردی گرانیتدا هەیە رەنگەکەی سەوز یان لەیلاقیە. |
| کونجنکتین | Conjunctin | (کونجەنکتین) ، جۆرێکە لە قەترەی چاو.. |
| کونستانتان | Constantan | (کۆنستانتان) ، دارشتەیەکە لە ٤٥٪ نیکل و لە ٥٥٪ مسی تیایە، تەل بەرهەڵستی تەوژمی کارەبای لێ دروست دەکرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| كونستوغة | Conestoga | كۆنستۆگا، کالیسکەیەکی گەورەیە، بۆ بارگواستنەوە، شەش وولاغی پێوەیە. |
| كونسوتينة | Conecrtina | کۆنسێرتینا ، جۆرێکە لە ئامرازی مۆسیقای ئۆکۆردیۆن. |
| كونشيرتينو | Concertino | کوشێرتینۆ، کۆنشێرتۆیەکی کورت، |
| كۆنشرتو | Concerto | کۆنشێرتۆ، ئاوازێکە بە ئامرازێکی مۆسیقی یان زیاتر لەگەڵ ئۆرکسترا لێ دەدرێت. |
| كونغا | Conga | کۆنگا، تەپڵێکی درێژو تەسکە. بە هەردوو دەست لێ دەدرێت. |
| كۆنكريت | Concrete | کونکریت، تێکەڵاوی چیمەنتۆو لمو ئاو بۆ ناو فەرش و سەربانی خانو، لە بیناسازیدا بەکاردێت، هەندێ جار شیش بەندی ئاسنیشی تێ دەکرێت بۆ دارشتنی سەربانی بینا. |
| كونكورد | | کۆنکورد، جۆرە فڕۆکەیەکی تازەیە زۆر خێرایە خێرایەکەی لە خێرای دەنگ زیاترە. |
| كوني | Cosmic | گەردونی ، هەر شتێك پەیوەندی بە گەردونەوە هەبێت. |
| كوني - وبر - زلم - بيكة | Coney = cony = pika = Hyrax | کونی، کەروێشکی ئەوروپی ، گیاندارێکی شیردەرە لاقەکانی ئەستورن تواناى ئەوەى هەیە کە خۆی بە بەردەوە بنوسێنێت. |
| كونية - جنفاض - حنيش | Canvas | گوێنی ، تەلیس |
| كونيلة | Cunila = Dittang = Stone = Mint | نەعنای بەرد، گیایەکی دەشتەکی پزیشکیە گەڵاکەی بۆنخۆشە گوڵەکەی بە شێوەی هێشووە. |
| كونياك - كنياك | Cognac brandy | قونیاغ، جۆرێکە لە مەی ، سەرخۆش کەرە. |
| كونكان | Conquian | کۆنکان، کۆنکەن جۆرێکە لە یاری بە کاغەز دەکرێت. |
| كومي | Black Winged kite | کۆلارەی باڵ ڕەش، جۆرێکە لە هەڵۆ. |
| كوهينور - جبل النور | Kohinoor | کۆهینۆر، کێوی ڕووناکی، پارچە ئەڵماسێکی گەورەیە لە هیندستان دۆزراوەتەوەو خراوەتە نێوان گەوهەرەکانی تاجی بەریتانییەوە. |
| كؤوس | Calices | کاسەکان |
| كؤوس الكلية | Renal Calices = calyces renales | کاسەکانی گورچیلە، ئەندامن لەناو گورچیلەدا. |
| كوي - كي | Cauterization | چزاندن، داخ کردن، برژاندنەوە، قرچاندن ، سوتاندن ، ئوتوکردن. |
| كوي الملابس | To iron Clothes | لە ئوتودان ، بۆ جلو بەرگ. |
| كوي - وسم بالمكواة | To brand | خاڵ کوتان لەسەر دەمو چاو. |
| كويثيت - جويثيت - خويثيت | Goethite | گۆیثایت ، مەعدەنێکە بریتییە لە ئۆکسیدی ئاسنی ئاوی ، ڕەنگەکەی قاوەیی‌یەکی تێر، بەرەو قاوەیی مەیلەو زەردە، کەرەسەیەکی خاوی گرنگی ئاسنە. |
| كويـزرات - اشباه النجوم = المصادر الراديوية شبه النجمية | Ouasars = stellar radio | گوێزەرەکان ، گوازەرەکان ، نیمچە ئەستێرەکان، کۆمەڵێکن لە تەنی ئاسمانی ، بریتین لە سەرچاوەیەکی بەهێز بۆ تیشکی ڕادیۆیی ، زۆر دوورن واتەوان لە ئاخی گەردووندا. |
| كويس | Calycle = Caliculus | کاسۆکە ، کاسەیەکی بچوك. |
| كويلة - دسار | Dowel | پارچە تەختە کە شتومەکی لێ دروست بکرێت. |
| كوينتيلون - مليون تريليون | Quintillion | کوینتیلیۆن، ملیۆن تریلیۆن، - ٠٠٠ ر ٠٠٠ ر ٠٠٠ ر ٠٠٠ ر ٠٠٠ ر ١٠٠٠. |
| كوينيدين | Quinidine | کوینیدین جۆرێکە لە دەرمانی نەخۆشی دڵ بە شێوەی حەب هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| كويكبـــات صغـــيرة - نجيمات = كويكب | Minor planets = Asteroids = planetoid | هەسارۆکە بچوکەکان ، بریتین لە هەزارەها تەنی ئاسمانی بە دەوری خۆردا دەسورێنەوە ، بە تایبەتی لە نێوان خولگەی هەسارەی (مەریخ و مشتری) دا پێکهاتی زۆربەیان کەمژی‌یە (صخری) و هەندێکیان ئاسنیان تیادایە، تیرەکەی لە هەشت کم کەمترەو تیاشیاندا هەیە تیرەکەیان لە ١٥٠ کم زیاترە گەورەترینیان دوانن سیریس (ceres) کە تیرەکەی ٩٩٢ کم پالاس (pallas) تیرەکەی ٥٠٤ کم تەنیا ئەستێرۆکەی (ڤیستا) بەچاو دەبینرێت زاناکان وای مەزەندە دەکەن کە ئەم ئەستێرۆکانە لە ئەنجامی تەقینەوەی هەسارەیەکەوە پەیدابوون. |
| كهانة - عرافة | Soothsaying | فاڵچێتی ، دەست خوێندنەوە. |
| كهربة - تكهرب | Electrification | کارەباندن ، کارەباوی کردن، کارەباویی بوون. |
| كهر ضوئي - كهربائي ضوئي | Photo elecric | کەهرو رووناکی ، کارەبایی رووناکی فۆتۆ ئەلکتریك. |
| كي - كوي | Causterization = Buring | داخ کردن، ئوتوکردن، برژاندنەوە. |
| كي - وسم | Brand | داخ کردن. |
| كي كيمياوي | Chemical causterization | داخ کردن بە مادەی کیمیایی. |
| كي كهربائي | Eiectro causterization | داخکردن بە کارەبا. |
| كيان - طبيعة | Nature | سرووشت. |
| كيان | Being | بوون، قەوارە. |
| كياسة - عقل | Intelligence = wisdom | زیرەکی، زرنگی، ژیری، وورییایی. |
| كياني | Autologous | قەوارەیی، بینەوەری. |
| كيال | Measurer | پێوەر ، قەپانچی. |
| كياك | Kayak | بەلەمێکە لە پێستە دروست کراوە هۆزی ئەسکیمۆ بەکاری دەهێنێت. |
| كيانيت - دايستين | Kyanite = Disthene | کیانایت، مەعدەنێکە بریتی‌یە لە سلیکاتی ئەلەمنیۆم بە شێوەی کریستاڵی شین، لە دروست کردنی مادەی دژی خوران و گەرمییدا بەکاردێت. |
| كيبو - نوتريا | Coypu = nutria | کویپور ، نیوتریا ، گیاندارێکی قرتێنەرە لە مشك دەچێت، لە ئەمەریکای باشورییدا بە شێوەیەکی دەستەکی دەژی ، بەڵام ئێستاکە لەبەر فەروە بە نرخەکەی زۆری لێ پەروەردە دەکەن. |
| كيبون - جيبون - جبون = اونكو | Gibbon | گیبۆن ، مەیمونێکی سوکەڵەی بێ کلکی باڵ درێژە لە هیندستانی خۆرهەڵات دەژی گەلێك جۆری هەیە. |
| كيبراشو - كبراش | Quebracho | کیبراشو ، کیبراکۆ ، درەختێکە لە بەشی خوارەوەی ئەمەریکای باشورییدا دەروێت لە ئەرجەنتین و شیلیدا دەروێت. تەختەکەی رەقە تەختەو گەفەکەی مادەیەکیان لێ دەردەهێنرێت بۆ دەباخ کردنی پێستە، هەروەها دەرمانی لێ دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی تەنگە نەفەسی ، بۆ بەهێزکردن. |
| كيبس - كبوش هجرس | Cebus = Capuchin | کابوشین مەیمونێکی لوت پانی بچوکی کلك درێژە. |
| كيتون - خيتون | Ketone | کیتۆن ، ئاوێتەیەکی ئۆرگانێکی بەکارە رەنگی کاربۆنیلی تیایە وەکوو (ئەسیتۆن). |
| كيتون - خيتون | Chiton | چیتۆن، گیاندارێکی نەرمی قاقڵەدارە بە بەردەوە دەنوسێت. |
| كيتين - كايتين | Chitin | کایتین ، دەردراوێکی رەقە پەیکەری دەرەوەی هەندێك گیانداری بێ جومگەی لێ پێك هاتووە وەکوو رۆبیان بۆ پاراستنی لەشە نەرمەکەی. |

| | | |
|---|---|---|
| كيت - كيتو | Ket = keto | كيتـا ، كيتـۆ ، پێشـگرێكە بـە مانـای مـادەی كيتـۆن كـە ئاوێتەيـەكی كيمياييیە. |
| كيتورية | Ketosis | كيتۆسيس، زيادبونێكی نائاسايی لە بڕی مادەی كيتۆن لە لەشدا وەكو لە كاتی نەخۆشی شەكرەدا. |
| كيثر | Polymer | پۆليمەر، ئاوێتەيەكی كيميايیيە لە چەند بەشێكی لە يەكچوويەيدا دەبێت وەكو نايلۆن. |
| كيجلية - مشطورة | Cucumber tree | دارخـەيار ، درەختێكـی دەسـتەكیو رازاندنـەوەی ناوچـە گەرمەكانـە، كۆمەڵەكـەی بـە شـێوەی هێشـووە گوڵەكـەی گـەورەو جـوانو رەنگينـە، بەرەكەی لە خەيار دەچێت توونە ناخورێت. |
| كيدم | Wrasse | جۆرەماسيەكی رەنگينە گۆشتەكەی دەخورێت. |
| كير - منفاخ | Bellow forge | دەمگا، هەمانەی فوكردن. موشەدەمەی كورەی ئاسنگەر. |
| كيرون | Kiron | (كـيرۆن) ، دەرمانێكـە لـە چارەسـەركردنی سـوتانەوەی كۆنـە ئـەندامی هەناسەدانو ئەنفلۆنزادا بەكاردێت. |
| كيرنايت | Kernite | (كێرنايت) ، مەعدەنێكە بريتیيە لە سۆديۆمو بۆرۆنو ئۆكسجين بێ رەنگ يان سپیيە، كەرەسەيەكی خاوە بۆ ڕۆن و بۆراكس. |
| كيروسين - نفط ابيض | Kerosene | كيرۆسين، نەوتی سپی لە نەوتی خاو دەردەهێنرێت دەكرێتە چراو زۆپاوە. |
| كيرش | Kirsch wasser | شەرابی گێلاس. |
| كيزلجور | Kieselguhr | كـيزلجور ، جۆرێكـە لـەمادەی ديـاتوميت لـە ئاوێتـەی بەربەسـت كـەرو چيمـەنتۆی دژی ئـاگرو پيشەسـازی تەقەمـەنیو لاسـتيكو پلاسـتيك دا بەكاردێت. |
| كيس - فطن | Intelligent | ژیر ، زیرەك. |
| كيس - كياسة - عقل | Inte lligence | ژیریی. |
| كيس - جراب - خريطة | Bag | تورەكە. |
| كيس - كيس السفاد | Vesicle = Bursa copulatrix | راوك ، تورەكە ، كيسە ، تۆربە ، جەوال. |
| كيس - غرارة - زكيبة | Sack = sac | خەرار ، تورەكەی گەورە. |
| كيس - حوصلة | Cyst = pouch | تورەكە ، سيكلأنۆچكە. |
| كيـس البـوغ - كيس الخبيرات | Sporangium = theca | سپۆرانجيەم ، تورەكەی سپۆر، ئەو تورەكەی بەرەی كەسپۆرەكانی تيادايە لە رووەكە گوڵ داپۆسراوەكاندا. |
| كيس جلدي | Leather bag = pouch | تورەكەی چەرم ، تورەكەی پێستی. |
| كيس الحشية | Tick = case of matress | بەرگەدۆشەك |
| كيس الدراهم = كيس النقود | Purse = money bag | جزدان، كيسەی پارە ، تورەكەی پارە. |
| كيـس نفطـي - حويصلة منوية | Spermatocyst = Seminal Vesicle | تورەكەی سپێرم. |
| كيس مشيمي | Chorionic sac | |
| كيسي | Saccular | |
| كيس وجني | Cheek pouch | تورەكـەیی گۆنـايی ، تـوورەكـەی رووومـەتی ، توورەكەيەكـە لـە رووومـەتی مەيمونو گياندارە قرتێنەرەكاندا خواردەمەنی تيادا هەڵدەگرن. |

| | | |
|---|---|---|
| كييس | Cyst | تورمكۆكه ، توورمكەيەكى بچووك. |
| كيس الحيامن | Spermsac | توورمكەى سپێرم. |
| كيس الجنيني - فوف | Embryosac | تورمكەى كۆرپەله. |
| كيس السفاد | Bursa Copulatrix | تورمكەى جووتكرتن ، وەكو له هەندێك گياندارا هەيه. |
| كيس الوسادة | Pillow case = pillow slip | بەرگه سەرين. |
| كيس اتجاه الريح - كيس الريح | Wind sack = wind cone | تورەكەى رێ رەوى با ، تورەكەى با ، تورەكەيەكى قوچه، دەكرێت به سەرى كۆلەكەيەكەوە بۆ پيشان دانى رێرەوى با بەكاردێت له فرۆكەخانەدا. |
| كيس العلف | Forage sack | عليجه، تورمكەى ئاليك، تورمكەى كاو جۆ. |
| كيس جلدي للماء - قربة الماء - زق | Water skin | جەوەنده، كونده ، جەوتك |
| كيس من الشعر | Sack | جەوال ، خەرار. |
| كيس الخض-كيس الممخضة | Churn | مەشكه ، بۆ ژەنينى ماست. |
| كيس التبغ | Tobacco pouch | كيسه تووتن، كيسەى تەماكۆ ، چاڵەى توتن. |
| كيس الدراهم | Purse | جزدان. |
| كيس جلدي لحفظ الأشياء و الأغذية | | هيزه ، هەمانه، جاخ ، هەمبانك. |
| كيس الخصية - صفن | Testicle = strotum | تورمكەى كون، كيسەى كون.كونەرێله، پێستى كون. |
| كيس الدمع | Lacrimal sac = lacryocystis | توركەى فرمێسك، كيسەى فرمێسك. |
| كيس مائي (الأكياس المائية) | Echino Co Ccosis = echino coccus cyst | تورمكەى ئاوى، ئيكنيۆكۆكەس، جۆرێكه له كرمى شريتى وەكو هاوژيانێك (معايش)، واته لێرەدا مشەخۆر نىيە، له ريخۆڵەى گياندار گۆشتخۆرەكاندا دەژين، وەكو تورمكەيەكى ئاويى دەژى ، پەلامارى شانەكانى لەش به تايبەتى جگەرى گاو مانگاو مەڕو ماڵاتو بەرازو مرۆڤ دەدات و دەبێته كاركەرێك بۆ نەخۆشى ترسناك. |
| كيس خيطي | Nematocyst | توورمكەى دەزوولەيى (دەزوولەدار) تورمكەيەكه دەزوويەكى پێچراوەى تيادايه له كاتى شێرزەيى و مەترسيدا ئەو دەزووه دەردەپەرێت له لەشى هەندێ گياندارا هەيه. |
| كيس عصبي | Neural cyst | تورمكەى دمارىى. |
| كيس - تكيس | Cyst- | پاشگرێكه به ماناى تورمكه. |
| كيسي - مثاني | Cysti = Cysto = Cystic | پێشگرێكه به ماناى تورمكەيى. |
| كيس اللقاح | Pollen sac | تورمكەى هەڵاڵه ( هەڵاڵەى گوڵ). |
| كيس اللس | Sting sac | تورمكەى گەستن، تورمكەى ژەهر، تورمكەى پێوەدان. |
| كيس اللسع | Egg sac = ovi sac | تورمكەى هێكه ، هێلكەدان. |
| كيس وريدي | Vein sac | تورمكەى خوێن هێنەر. |
| كيس هوائي | Air sac = air bladder | تورمكەى هەوا ، تورمكەى هەوايى. |
| كيس الصفراء = كيس المرارة | Gall bladder | تورمكەى زراوە ، تاڵاو زاره. |
| كيس الصوت | Vocal sac | تورمكەى دەنگ، تورمكەى دەنگ كردن له گياندارا وەكوو له بۆقدا. |
| كيس زلالي - كيس بروتيني | Buras = synovial = bursa = synovial cyst | تورمكەى پرۆتينى ، تورمكەيەكه پڕه له شلەيەكى لينج وە به تايبەتى له جومگەكاندا هەيه. |

| | | |
|---|---|---|
| كيس العوم = كيس الغاز - كيس هوائي | Gas bladder = air bladder | تورەكەی سەر ئاو كەوتن، تەقڵی تۆقان، تورەكەیەكە لەناو سكی ماسی‌دا بۆ لەنگەركردن‌و بەرزو نزم بوونەوە لە ئاودا بەكاردێت، ئەم تورەكەیە وا لە كێشی جۆریی ماسی دەكات كە یەكسان بێت بە كێشی جۆریی ئاوەكە. |
| كيس دهني | Wen | |
| كيش غشائي | Cyst | تورەكەی پەردەیی |
| كيس المح | Yolk sac = Vitellicle | تورەكەی زەردێنەی هێلكە. |
| كيس زهمي - كيس دهني | Sebaciouscyst | تورەكەی چەوریی. |
| كيس سلكي | Nemato | تورەكەی كرمی، تورەكەیەكە لە كرمە باریكەكاندا پێوە دەدات. |
| كيس ليفي | cyst | تورەكەی ریشاڵی. |
| كيس | Ovariancyst | تورەكەی هێلكەدانی. |
| كيس | Ink sac | تورەكەی مەرەكەب ، لە گیانداری هەشت پێدا، (ئەختەبوت) هەیە. |
| كيس مفصلي | | تورەكەی جومگەیی، تورەكەی جومگە. |
| كيس دهن الجفن = كلازيون | Chalazion | كلازیۆن، تورەكەی چەوری پێڵو. |
| كيس ديداني | Hydatid | تورەكەی كرمێن، تورەكەیەكی ئاودارە كرمی تیایە لە لەشی سەگ‌و گورگدا پەیدا دەبێت. |
| كيس البحر | | تورەكەی دەریا، جۆرە گیاندارێكی دەریاییە. |
| كيسيات - حيوانات كيسية - جرابيات | Marsupialia | تورەكە دارەكان ، گیاندارە تورەكەدارەكان ، وەكو كەنگەر. |
| كيس الفحم | Coal sack | تورەكە خەڵوز ، پەڵە هەورێكی گەورەیە لە غاز یان تەپوتۆز ڕووناكی ئەستێرەكان دەمژێت وەكوو پەڵەیەكی رەش دەردەكەوێت لە كاكێشاندا. |
| كيس منوي | Sperm sac | توورەكەی سپێرم. |
| كيس المتك - المنوي - مئبر | Pollen sac | پۆزرك.توورەكەی هەڵاڵە، توورەكەی مادەی نێر، لە گوڵی رووەكدا. |
| كيس السلي | Amniotic sac = amnion | ئەو تورەكەیەی كە دەورووپشتی كۆرپەلە دەدات لە منداڵداندا. |
| كيس البذور | Seed sac | تۆو بەرە ، تورەكەیەكە تۆوی تێ دەكرێت بۆ چاندن. |
| كيس الراعي - قرملة - خرفق - خرد فارس | = capweed = | پەیكۆل ، تورەكە شوانە، پەیكولە ، گیایەكی دڕكاوییە گوڵێكی سپی دەگرێت. |
| كيس التين - غرارة | Sack of straw | رەشكە. |
| كيشة - نعرة | Embryo of animal | بێچوو ، بەرخۆڵە ، ئاولەمە، بێچووی گیاندار. |
| كيشوو | Cachou | كێشوو، حەبێكی شیرینە بۆ بۆنخۆش كردنی هەناسە بەكاردێت. |
| كيغ | Keg | كێگ، بەرمیلێكی بچووكە قەبارەكەی (٣٠) گاڵۆنە. |
| كيف - حال - كيفية | State = Condition | بار ، جۆنێتی. |
| كيفليكس | Keflex | (كیفلیكس) دەرمانێكە بە شێوەی گولاجە دژی میكرۆب بەكاردێت. بۆ چارەسەركردنی سوتانەوەی پێست‌و ددان‌و ئێسك‌و جومگەو ڕێبازی مێزو زاوزێ. |
| كيفلين | Kefline | كیفلین، دەرمانێكە دژی میكرۆب بەكاردێت بە شێوەی دەرزی هەیە. |
| كيفالين | Cephalin | سیفالین |
| كيفية - صورة | Manner = Mode = Fashion = form | شێوە. |

| | | |
|---|---|---|
| كيفية - صفة - نوعية | Quality = Kind = Qualitative | چۆنێتی ، جۆرێتی. |
| كيف - كيف الحشيش | Hasheesh = bhang = kef | حەشیشە، کەیف ، بەنگ ، مادەیەکی بێ هۆش کەرە. |
| كيفي - نوعي | Qualitative | جۆریی ، چۆنێتیی. |
| كيك | Cake | کێك ، جۆرێکە لە خواردەمەنی. |
| كيك الكروم | Chrome Cake | کێکی کرۆم، کێکێکی خوێیی سەوزە (بریتی‌یە لە گۆگردانی سۆدیۆم). رێژەیەکی کەمی لە توخمی کرۆم تیادایە لە دروست کردنی کاغەزدا بەکاردێت. |
| كي كهربائي | Flecyro cautery | داخی کارەبایی ، داخ کردن بە کارەبا. |
| كيل معايرة | Gauging = measure = Drymeasure | پێوانە، پێوان ، تەغار ، پیڤان. |
| كيلة | Keel | کەشتی‌یەکە بنکەکەی تەختە بۆ گواستنەوەی خەڵوزی بەردین بەکاردێت. |
| كيلس | Cheilinus | کیلەس، ماسی‌یەکی دەریایی‌یە دەخورێت. |
| كيلة - ٢و١ | Kila = Acorn = measure | کیلا ، ٥و١٦ کیلۆ. |
| كيلب | Kelp | کێلپ، (١) قەوزەی قاوەیی (٢) گیای دەریایی سوتاو کە مادەی یۆد (ئایودینی) لێ دەردەهێنرێت ، رەنگەکەی سورە. |
| كليو | Kilo | کیلۆ ، هەزار ، ($10^3$) |
| كيلو جول | Kilo Joule | هەزار جول ، کیلۆ جوول. |
| كيلو كالوري - كيلو سعرة | Kilo Calori = Kilo Calorie kgCal | کیلۆ کالۆری ، کیلۆ گەرمۆکە ، هەزار کالۆری ، هەزار یەکەی پێوانی گەرمی ، بڕی ئەو گەرمی‌یەی کە پێویستە بۆ بەرزکردنەوەی (پتر کردنی ) کیلۆ گرامێك لە ئاو ، یەك پلەی سەدی. |
| كيلوغرام | Kilo gram | کیلۆ گرام ، هەزار گرام، یەکەی پێوانی کێش، ٢/٢ پاوەند، ٣٣٧/٥ درهەم. |
| كيلو غرام متر | Kilo gram meter | کیلۆ گرام مەتر ، یەکەی پێوانی کار ، دەکاتە ئەو هێزەی کە پێویستە بۆ بەرزکردنەوەی کێشی کیلۆگرامێك بۆ ماوەی مەترێك. |
| كيلو فولت | Kilo Volt | کیلۆ ڤۆڵت ، هەزار ڤۆڵت (یەکەی هێزی جوڵێنەری کارەبایی). |
| كيلو واط | Kilo watt | کیلۆ وات ، هەزار یەکەی پێوانی بڕی کارەبا، یەکەی پێوانی توانای کارەبایی، ١٠٠٠ وات. |
| كيلو واط / ساعة | Kilo watt hour | کیلۆ وات کات ژمێر ، یەکەیەکی ووزە یان ئیشە دەکاتە بڕی ئەو ووزەیەی کە دەزگایەکی کارەبای لەیەك کات ژمێردا کاری دەکات. |
| كيلو سايكل | Kilo Cycle | کیلۆ سایکل ، کیلۆ خول ، بەکەیەکە دەکاتە (١٠٠٠) خول (دورە) بە تایبەتی لە یەك چرکەدا، لە کاتی پیشاندانی لەرەی (تردد) شەپۆلەکانی ئیستگەو دەنگدا ناوی دێت، یەك کیلۆ سایکل ئەکاتە ١/١٠٠٠ میکاسایکل. |
| كيلو طن | Kilo Ton | (١( هەزار تەن. (٢) هێزی تەقینەوەیەك کە یەکسانە بە هەزار تەن لە مادەی (تی ئێن تی). |
| كيلو لتر | Kilo liter | کیلۆ لەتر، هەزار لەتر ، هەزار لیترە، یەکەی پێوانەی قەبارە. |
| كيلو متر | Kilo meter = Km | کیلۆ مەتر ، هەزار مەتر، یەکەی ، پێوانی درێژی -١٠ هیکتۆمەتر، ١٠٩٣/٦ یاردە، ٦٢١٤ و. میل. |
| كيلوس | Chyle | کیلۆس، شلەیەکی سپی شیریە بریتی‌یە لە گوشراوی خواردەمەنی هەرس کراو لە ریخۆڵەی دوانزە گرێدا. |

| | | |
|---|---|---|
| كيلون = قفل | Lock | قفل. |
| كيم | Kame | کەیم، گردۆڵکەیەکە لە رووباری سەهۆڵی یەوە پەیدا دەبێت. |
| كيمن | Cayman = Caiman | کایمەن، تیمساحی ئەمریکی، جۆرە تیمساحێکە لە ناوچە گەرمەکانی ئەمریکا دەژی. |
| كيمون | Kimono | کیمۆنۆ، کراسێکی فراوانی یەخە فراوانە. |
| كيموس | Chyme = Chymos | کیمۆس، شلەیەکی شیری خەستە بریتی‌یە لە خواردەمەنی هەرس کراو لە گەدەدا. |
| كيمونيت | Chemonite | کیمۆنایت، گیراوەیەکە لە هایدرۆکسیدی مس ١/٨٤٪ و سێ‌هەم ئۆکسیدی زەرنیق ١/٣٪ ئامۆنیا ٢/٨٪و سرکە ٥٠و٪ و ئاو بۆ پاراستنی تەختە. |
| كيموسين-رنين | Chymosin = Rennin | کیمۆسین، ئەو ئەنزیمەیە کە لە لووەکانی گەدەوە دەدرێت دەبێتە هۆی مەیینی شیر ، لە مەیدانی پزیشکی‌و دەرمان سازی‌و دروست کردنی پەنیردا بەکاردێت‌و دەکرێتە هەندێك خۆراکەوە. |
| كيموغراف | Kymograph | کیمۆگراف ، ئامرازی وێنەگری پاڵەپەستۆی خوێن، ئامرازی تۆمارکردنی جووڵە یان پەستان. |
| كيمورجي - كيمياء فنية - كيمارجيا - كيمورجيا | Chemurgy | کیمورجی ، لقێکی تازەیە لە زانستی کیمیا باسی پاشماوەی مادە کشتوکاڵی یەکان دەکات لە رووی بەکارهێنانیانەوە لە پیشەسازی‌دا. |
| كيمياء | Chemistry | کیمیا، زانستی خوێندنی مادەکان ، لە بابەت پێك هاتن‌و شی کردنەوەو سیفەت‌و سوودەکان‌و بەکارهێنانیانەوە. |
| كيميائية | Chemism | چالاکی کیمیایی. |
| كيمياء آثارية | Archeological chemistry | کیمیای ئاسەوار، کیمیای شوێنەوار بەشێکە لە کیمیا بە شیکردنەوە باسی ئەو مادانە دەکات کە لە شوێنەوارەکاندا دەدۆزرێتەوە، بە بەکارهێنانی ئامرازی شەبەنگ پێوو تیشکی ئێکسی ، هەروەها بۆ دەست نیشان کردنی تەمەنی ئەو مادانە. |
| كيمياء قديمة | Alchemy | ئەلْچیمی، کیمیای کۆن، پەیوەندی بە گۆڕینی هەندێك کانزای هەرزان بەهای وەکوو قورقوشمەوە هەیە، بۆ زێڕ هەر چەندە کیمیایەکی ئەفسانەیی بووە، لە دامەزراندنی زانستی کیمیای نوێدا ڕۆڵی هەبووە. |
| كيمياء غروية | Colloid Chemistry | کیمیای مادە مڵەکان، لقێکە لە زانستی فیزیایی باسی سیفەتی ئەو دیاردەی مادەیە دەکات کاتێك کە یەکێك یان زیاتر لە دووری‌یەکانی (ابعاد) لە نێوان (١) میلی مایکرۆن (نانۆمەتر) و یەك مایکرۆن (مایکرۆمەتر) دابێت.، لەبەر ئەوە زانستی‌یەکە هەر تەنۆکە ووردەکان ناگرێتەوە، بەڵکو ، فلیم و ریساڵ‌و کەف . هتد دەگرێتەوە، دەشێت پارچەکانی (ووردیلەکانی) Particles گازی یان شلە یان رەق بن، وەکوو : رەق/ گاز(ئیرۆسۆك) ، رەق / رەق ، شل / شل (هەمەڵشن) گاز/ شلە وەکو (کەف). |
| كيمياء كونية - علم كيمياء الكون | Cosmo Chemistry | کیمیای گەردوونی. |
| كيمياء اقتصادية | Chemical economics | کیمیای ئابوری، زانستی بەکارهێنانی بنەماکانی ئابووری پیشەسازی یانە لە دروست کردنی کەل‌و پەل کیمیایی‌دا. |

| | | |
|---|---|---|
| كيمياء اشعائية - كيمياء شعاعية | Radio Chemistry | كيمياى تيشكى، لقێكه له زانستى كيميا باسى رەفتارى كيمياى ماده تيشك دەرەوەكان دەكات، كيمياى تيشك دانەوە. |
| كيمياء حيوية - كيمياء احيائية - كيمياء حياتية | Bio chemistry = bio logical Chemistry | كيمياى ژيان ، كيمياى زيندەگێتى ، لقێكه له زانستى كيميا باسى كار لێك كردنى كيمياى دەكات له مادەى زيندوودا (واته له لەشى گياندارو رووەكدا) وەك پێك هێنانى خۆراك به يارمەتى رووناكى و خۆرو رۆڵى ئەنزيمەكان . هتد |
| كيمياء فراغية | Stereo chemistry | كيمياى بۆشايى ، لقێكه له زانستى كيميا باسى پەيوەندى بۆشايى دەكات له نێوانى ئەو رەگە كيماى يانەى كه لەگەڵ ئەتۆمەكانى كاربۆندا يەكيان گرتووە. |
| كيمياء الخلايا | Cyto Chemistry | كيمياى خانەكانى لەش. |
| كيمياء فلكية | Astro chemistry | كيمياى ئەستێرەوانى بريتىيە له بەكارهێنانى (كارپێكردنى) ئەستێرەزانى تيشكى (مايكرۆوێڤا شەپەنگ پێوان) بۆ بڕياردان لەسەر بوونى مادەى كيمياى له هەورە گازىيەكانى بۆشايى نێوان ئەستێرەكاندا، هەروەها لەناو ئەستێرەكان خۆياندا ، ئەمەش له ئەنجامى لێكۆڵينەوە لەو روناكىيەى كه له خۆر يان ئەستێرەكانەوە دەردەپەڕێت. |
| كيمياء كهربائية - الكهروكيمياء | Electro chemistry | كيمياى كارەبايى ، لقێكه له كيميا باسى پەيدا كردنى كارەبا دەكات به رێگەيەكى كيميايى وه باسى ئەو گۆڕانه كيمياى يانه دەكات كه كارەبا پەيدايان دەكات. |
| كيمياء عضوية | Organic chemistry | كيمياى ئەندامى ، لقێكه له زانستى كيميا باسى ئەو مادانه دەكات (واتا ئاوێتەكانى كاربۆن ، كه له لەشه ئەندام دارەكاندا (گياندارو روەك) پەيدا دەبن. |
| كيمياء غير عضوية - كيمياء لا عضوية | | كيمياى نا ئەندامى ، لقێكه له زانستى كيميا باسى ماده نائۆرگانيكيەكان دەكات (واتا توخمو ئاوێته نا كاربۆنيەكان). |
| كيمياء صناعية | Industrial chemistry = chemical industry | كيمياى پيشەسازى ، لقێكه له زانستى كيميا باسى پەيوەندى كيمياو پيشەسازى دەكات. |
| كيمياء تحليلية | Analytical chemistry | كيمياى شى كردنەوەيى، لقێكه له كيميا پەيوەندى بەدەست نيشان كردنى جۆرى ئەو مادانەوەيە هەيه كه له ئاوێتەيەكدا هەن (شى كردنەوەى جۆريى)، هەروەها دۆزينەوەى رێژەى سەدى بڕى ئەو مادانەى لەو ئاوێتەيەدا هەن (شى كردنەوەى بڕى). |
| كيميا تركيبية | Synthetic Chemistry | كيمياى پێكهێنان. |
| كيمياء فيزياوية | Physical chemistry | كيمياى فيزيايى ، لقێكه له زانستى كيميا باسى پەيوەندى نێوان زانستى كيمياو زانستى فيزيا دەكات |
| .كيميا نوويه | Nuclear Chemistry | كيمياى ناووكى ، لقێكه له زانستى كيميا باسى ناووكى ئەتۆمى ماده دەكات. |
| كيمياء ضوئية | Photo Chemistry | فوتوكيمسترى ، كيمياى رووناكى، لقێكه له زانستى كيميا باسى كارى رووناكى دەكات بەسەر مادەكاندا، يان باسى كارى ووزەى تيشك دەكات له پێكهێنانى گۆڕينى كيمياىدا. |
| كيمياء ارضية | Geo Chemistry | جيوكيمسترى، كيمياى زەوى ، لقێكه له زانستى كيميا باسى مادەكانى زەوى دەكات. |
| كيمياء طبية - كيمياء دوائية | Medicinal Chemistry | كيمياى پزيشكى |

| | | |
|---|---|---|
| كيمياء طبية شرعية | Forensic Chemistry | كيمياى پزيشكى ياسايى |
| كيمياء صيدلية | Pharmaco Chemistry | كيمياى ئەجزاخانە ، كيمياى دەرمان سازى. |
| كيمياء زراعية | Agricultural Chemistry | كيمياى كشتوكاڵ. |
| كيمياء التربة | Soil Chemistry | كيمياى خاك. |
| كيمياء التخمر | Zymurgy | كيمياى ترشان، كيمياى ترشانى مادەكان. |
| كيمياء فسيولوجية | Physiologic chemistry | كيمياى فسيۆلۆجى، كيمياى فرمانەكانى ئەندامەكانى لەش. |
| كيمياء سريرية | Clinical Chemistry | كيمياى كلينيكى ، لقێكە لە زانستى كيميا پەيوەندى بە هەموو جۆرە شلەكانى لەشەوە هەيە وەكوو : خوێن ميز ،دەردراوى لوەكان. |
| كيمياء فتوغرافية - كيمياء تصويرية | Photographic Chemistry | كيمياى فۆتۆغرافى ، كيمياى وێنەگرتن، بەكارهێنانى كيميا لە فليمى فۆتۆغرافيدا وەكوو: ئەوەى كە فليمەكە بە توێژاڵێكى تەنك لە هاليدى زيبوو جەلاتين رووكەش دەكرێت. |
| كيمياء حرارية | Thermo Chemistry | كيمسترى ، كيمياى گەرمى ، لقێكە لە زانستى كيميا پەيوەندى نێوانى گەرمى و كيميا پيشان دەدات. |
| كيميائي - عالم بالكيمياء | Chemist | كيميايى، كيمياگەر، واتە ئەوەى كە لە پيشەى كيميابيدا ئيش دەكات. |
| كيمياوي | Chemical | كيمياى، شتێك پەيوەندى بە كيمياوە هەبێت. |
| كيمياوي | Chemo- = chem- | پێشگرێكە بە ماناى كيميا. |
| كيمستين | Kemicetine | كيمستين، دەرمانێكە دژى ميكرۆب بەكار دێت بە شێوەى دەرزى هەيە. |
| كينا - شجرة الكنيني - شجرة السنكونا - كنكينا | Quinquina Tree (cinchona) | كينا، درەختى قەنەقينە درەختى سينكۆنا، درەختێكە توێكڵەكەى (گەفەكەى) وەكوو دەرمانى لەرزوتا بەكاردێت، مادەى ئەلكالۆيدى تيادايە. |
| كينة - بظر | Clitoris | قيتكە. |
| كينتو غراف | Kinetogr aph | كينتۆ گراف ، كامێراى وێنەگرتنى تەنە جووڵاوەكان. |
| كينتوسكوب | Kinetoscope | كينتۆسكۆپ، ئامرازێكە بۆ پيشاندانى ئەو وێنانەى كە بە كينتۆگراف گيراون. |
| كينسكوب - مصوار | Kinescope | كينسكوب، بۆرى وێنە لە دەزگاى وەرگرى تەلەفزيۆندا. |
| كينكاجو | Kinkagou | كينكاجۆ ، جۆرە گياندارێكە لە كۆمەڵەى (راتۆن) كلكى وەكوو مەيمون بەكار دەهێنێت، بۆ چوون لە لقێكەوە بۆ لقێكى تر لە ناو درەختەكاندا. |
| كينماتيكا - علم الحركة المجردة | Kinematics | كينماتيكس، خوێندنى جووڵەى تەنەكان بە چاوپۆشين لەو هێزانەى كە كارى تێ دەكەن. |
| كينيتيكا - الحركيات | Kinetics | كينتيكس، زانستى خوێندنى جووڵە واتە جووڵانەوە ، لێكۆڵينەوە لە كارى هێز بەسەر جووڵەى تەنەكاندا. |
| كينولين | Quinoline | كوينۆلين ، مادەيەكە كە لە دڵۆپاندنى خەڵوزى بەردينى قيريى دەردەهێنرێت دەرمانى لێ دروست دەكرێت. |
| كينودين | Quinodine | كوينۆدين ، جۆرێكى هەرزان بەهايە لە كنين. |
| كينو - صندل هندي | India wood | سەندەڵى هيندى. ، جۆرێكە لە درەختى سەندەل، تەختەكەى بە نرخە، شيراوگێكى گيرگەر (مقبض) لە قەدەكەى دەردەهێنرێت پێى دەوترێت (كينۆى هيندى). |
| كينوا | Chenopodiumquinia | كوينا، جۆرێكە لە رووەكى پێ قازە (رجل الاوز) ، گيايەكى ساڵانەيە گەڵاكەى وەكوو سپێناخ لە ئەمريكادا بەكار دێت. |

| | | |
|---|---|---|
| كينوزوي - سينوزوي = دهري حديثي | Cenozoicera | سينۆزۆی ، یەکێکە لە دێرینەکانی ژیان (١٧٠) ملیۆن ساڵ بەردەوام بووە، تیایدا گیانداره شیردەرەکان زاڵ بوون و لە کۆتاییدا مرۆڤی تیادا دەرکەوتووە. |
| كينونة | Being = existing | بوون. |
| كينون | Quinone | کینۆن، ئاوێتەیەکی ئۆرگانیکیە رەنگێکی زەردی هەیە لە بەنزین دروست دەکرێت. |
| كينيت | Kainite | کلینایت، خوێی پۆتاسی سروشتی بریتی‌یە لە کلۆریدی پۆتاسیۆم و گۆگرداتی مەگنیسیۆم ، بۆ پەین باشە. |
| كينين - كينا - كنين | Quinine | کوینین، کنین ، قەنەقینە ، تۆزێکی تاڵی سپیە لە توێکڵی درەختی سینکۆنا دەردەهێنرێت بریتی‌یە لە دەرمانی لەرزوتا. |
| كينو | Keno | کینۆ ، جۆرێکە لە یاری قومار. |
| كيوي - ريباس صيني | Kiwi = Chinese goose berry | کیوی، دەوەنێکە لە کۆمەڵەی کشمیش. |
| كيراتين - كراتين | Creatine | کریاتین، مادەیەکە لە گۆشتدا هەیە. |
| كيوجزام | Cuoxam | کیوکزام، گیراوەیەکە لە کاربۆناتی مس و نەوشاتر، سلیلۆز دەتو تێنێتەوە. |
| كيوت - قيوط | Coyote | کیوت، گورگێکی بچووکە لە باکووری ئەمریکا دەژی. |
| كيوتين | Cutin | کیوتین، مادەیەکی مۆمی‌یە لەگەڵ سیللیولۆز یەك دەگرێت بۆ پێکهێنانی توێژاڵی روی گەڵای رووەك. |
| كيوتيكل | Cuticle | کیوتیکل، توێژاڵی ڕووی گەڵای ڕووەك کە مادەیەکی مردووە. |
| كيَوس | Cayuse | کایوس، ئەسپێکی ئەمەریکی بچووکە هیندی‌یە سوورەکان بەکاری دەهێنن. |
| كيوي | Kiwi = apterix | کیوی ، باڵندەیەکە توانای فڕینی نی‌یە لە نیوزلەندە دەژی. |
| كيولكس - برغشة | Culex | کیوڵکس، جۆرێکە لە مێشولە نەخۆشی لەرزو تای باڵندە بڵاو دەکاتەوە. |
| كيوبلا | Cupola | کیو پۆلا، تەنورێکی بچوکە بۆ کانزاکردنی ئاسن و دارشتە بەکاردێت. |
| كيك | Caique | کەیك، بەلەمێکی درێژە. |
| كييس | Sacculus | تورەکۆکە، تورەکۆلە، تورەکەیەکی بچووك. |

| | | |
|---|---|---|
| لا = بلا | | پێشگرێکە بە مانای نا، بەبێ. |
| لا احيائي | Abiotic | نازیندەگی ، نازیندەوەری |
| لا ارادي | Involuntary | خۆنەویست |
| لا ارادة | Laboulia = abulia | |
| لا استجمية = لا استكمية - لا بؤرية | Astigmation = astigmutiou = Astigmatism | (ئەستیگماتیزم) نارێکیەکە، لە بینینی چاودا بە هۆی چەماوەیەکی نارێك لە کۆرنیا یان زەرەبینی چاودا. |
| لا انفاذي | Impermeable | ناگوزەرداری ، سیفەتێکە لە هەندێك مادەدا کە ناهێڵێت هەندێك مادەی پیادا گوزەر بکات وەکوو لاستیك کە ناهێڵێت ئاوو هەوای پیادا گوزەر بکات. |
| لائق | Suitable = fit, appropriate | شیاو = گونجاو = شایان - زێبا = رەوا = لێ هاتوو = لێ وەشاو. |
| لائحة | Prospectus | کەلاڵە نامە = ژمێرامە. |
| لائحة قانونية | Regulation rule | کەلاڵەی یاسا. |
| لابنة | Lactiferous | (١) شیرگوێزەرەوە - ئەو بۆڕییەی کە شیری گیاندار یان شیراوی هەر شتێك شیر بدات دەگوێزێتەوە. |
| لا بتلي = لا تويجي | Apetalous | بێ پەرە - ئەو رووەکەی کەگوڵەکەی بێ پەرەیە وەك گوڵی گەزنەو گووش. |
| لا بيتوس | Lapetus | لا پیتوس، یەکێکە لە پاشکۆکانی هەسارەی کەیوان، دووری لە هەسارەکەوە ٢٢٢٥ x $١٠^{٣}$ میلە، تیرەکەی = ٢٥٠ میلە. |
| لا اخدوديات | Aglyphodonate | بێ درزەکان -بێ تلێشەکان، کۆمەڵەیەکە لە مار دانی ژەهرینیاش نییە. |
| لا الكتروليت | Non electrolyte | نا ئەلکترۆلیت ، مادەیەکە گیراوە ئاوییەکەی کارەبا ناگەیەنێت. |
| لا اخلاقي | Immoral | نا ئەخلاقی، بەدرەوشتی. |
| لا اصبعي | Adactyl | بێ پەنجەیی. |
| لا اوكسية =انوكسيا | Anoxia | نائۆکسی - (ئەنۆکسیا)، کەمی ئۆکسیجینی شانەکانی لەش. |
| لا اوكسيمية | anoxemia | نا ئۆکسانی خوێن. |
| لابة - حمم | Lava | (لاڤا) دەرهاوێژراوە گڕکانییەکان وەك ئەو بەردە شلەوە بووە گەرمانەی کە لە زاری گڕکانەکانەوە دێنە دەرەوە و لە دواییدا سارد ئەبنەوە. |
| لابة باهو هو | Pahoehoe | لاڤای چیایی - لاڤای پاهۆیهۆی، ، جۆرێکە لە لاڤای شەپۆلداریان چرچ لە دەورگەی هاوای هەیە. |
| لا بلع | Aphagia | ناقووت دان - نەتوانینی قووت دان. |
| لابة وسادية | Pillow lava | لاڤای سەرینی - لاڤای بالیفی، جۆرێکە لە لاڤا لە دەریاو دەریاچەکاندا زۆرە لە شێوەی تۆپەڵی وەکوو سەرییندایە. |
| لابة حبلية | Roppy lave | لاڤای پەتکی. |
| لابة ليفية | Peles hair | لاڤای ریشاڵی - شووشەی سرووشتی ریشاڵی . |
| لابرادوريت = لبرادوريت | Labradorite | لابرادۆرایت ، مەعدەنێکە لە کۆمەڵەی پلاجیۆکلێز ، جۆرێکە لە فیلدسپار. |
| لا بلورية | Amorphia | نابلووریتی. |
| لاتيريت - بصرة | Laterite | (لاتیریت) ، گلێکی یان خۆڵێکی یان بەردێکی سووری کون کونەلە سلیکاتی ئاسن و ئەلەمنیۆمی ئاوی پێك هاتووە.. |
| لترتة | Laterization | لاتیراندن، گۆڕانی کەمڕ ، بۆ لاتیرایت. |
| لا توازن | Unbalance | ناهاوسەنگی |

| | | |
|---|---|---|
| لا تماثل | Asymmmetry | ناجووتی‌یەکی - نا لێك چون. |
| لا تذوق | Aguesia | ئاتامی -ناچێژیی |
| لا تعرق | Anhidrosis | بێ ئارەقی- ئارەق نەکردنەوە. |
| لا تسمية | Anomia | بێ ناویی. |
| لابيس لا زولي = لازورد | Lapis-lazuli | لا پیس لازولی ، جۆرێکە لەو بەردە بە نرخەی کە پێی دەوترێت(سافیر) بەردێکی شینی جوانی پەڵەدارە لە کالسایت پێك هاتووە بۆ مەبەستی رازاندنەوە بەکار دێت. |
| لابرينثودونت | Labyrinthodont | (لابرینسۆدۆنت) گیاندارێکی تەڕووشکی قڕ تێ کەوتووە بە سەرەتای گیاندارە تەڕووشکی‌یەکان دادەنرێت. |
| لات | Lat | (لات) یەکەی دراو لە وڵاتی لاتڤیا. |
| لاتانيا - لتانية | Latania = fan ralm | لاتانیا - دارخورمای باوەشێنی ، درەختێکە لە کۆمەڵەی دارخورما گەڵاکەی لە باوەشێن دەچێت بۆ مەبەستی رازاندنەوەو پیشەسازیو خۆراك دەروێنرێت. |
| لا تنسني = اذان الفار | Forget me not = Mouse ear = Myosotis = Majorana | جاترە کێویلە = مەرزە - مەرزنگوش - مردەگوش - گوێ مشکە، گیایە کە گوڵێکی جوان دەگرێت. |
| لاتيني - كبوسين = ابو خنجر - طرطور الباشا | Nasturtium | (لاتینی) جوکلانە - جۆرە گوڵێکە. |
| لاتن | Latten = Lattin | لاتین (١) تەحرێکە لە مەعدەنی مسی زەرد بە شێوەی تەبەقی تەنك هەیە (٢) لەوحێکی ئاسن بە تەنەکە(قصدیر) داپۆشرابێت. |
| لاتيني | Latin | لاتینی - ڕ زمانی - دەگەڕێتەوە بۆ لاتینۆم کە یەکێکە لە ناوچەکانی وڵاتی ئیتاڵیا. |
| لاتيكس | Latex | (لاتیکس) = شیراوە، شلەیەکی شیریە لە بریندارکردنی توێکڵی رووەکەوە دێتە دەرەوە وەکوو شیراوەی لاستیكو بەنگو کاهوو تاڵیشك. |
| لا تجانس | Heterogeneity | ناچوون یەکی. |
| لاثيرين - لاترين | Lathyrine | (لاسیرین) مادەیەکی نیمچە ئەلکالییە لە دەنکی رووەکی خلیرە دەردەهێنرێت. |
| لاثديية - ضهى | Amastia = amazia | بێ مەمکی ، نەبونی مەمك |
| لا ثمري - عديم الثمر | Acarpous | بێ بەر ، ئەو رووەکەی کە بەری نی‌یە. |
| لاجيء - ملتجيء | Refugee = shelter | پەنابەر = داڵدەبەر. |
| لا جنسي - لا شقي | Asexual = agamic = agamous | نارەگەزی ، زاوزێ بەبێ جووت کردن، وەکوو لە گیاندارو رووەکە نزمە یان ساکارە تاك خانەیی‌یەکاندا روو دەدات، کە ئەندامی زاوزێیان نی‌یە، بە رێگەی دابەش بوونی خانەکانیان زیاد دەکەن. |
| لا جنسية | Asexuality | نارەگەزێتی. |
| لا جوفي - لا سيلومي | Acoelous = acelomate | بێ بۆشایی؛ سیفەتێکە بۆ گیاندارێك کە گەدەیان بۆڕی هەرس یان بۆشایی تیادا نەبێت وەك گیانداری هایدرا. |
| لا جناحية = عديمات الأجنحة | Ophaniptera | بێ باڵەکان ؛ ئەو گیاندارانەی کە باڵیان نی‌یە وەکوو کێچ. |
| لاحب | Electrode | ئەلیکترۆد - پۆڵی کارەبایی - جەمسەری کارەبایی. |
| لاحقة - لاحق | Appendage = accessory | پاشەنگ - پاشوو - پاشکۆ - دوا بەدوا - پاشەر - پێ بەند - زیادە |
| لاحق | | نیشتەجێی مانگ ؛ پێنج ئەستێرەن لە کەلووی (قۆنگرەی) گادا |
| لاحم - لواحم - اكل اللحم | Zoophagous = cornivorous | گۆشت خۆر - گیانداری گۆشت خۆر. |

| | | |
|---|---|---|
| لاحسة السكر | Silver fish = bristle tail | شەکرلێس ، جۆرە مێروویەکی بچووکی رەنگ زیویویە شەکر دەلێسێتەوە کاغەزو کتێب دەقرتێنێت لەناو ماڵاندا دەژی. |
| لاحشويات - مجوفات البطن - جوفية المعي - امعائية الجوف | Coelenterata | بۆش ریخۆڵەییەکان ، لقێکە لە گیاندارەکان بە زۆری دەریایین، وەکوو هایدراو گوڵاڵەی دەریا ، لەشیان تەنها یەك بۆشایی تیادایە کە بەدەم دەست پێ دەکات و بە کونی کۆم کۆتایی دێت. |
| لاحموضية | Anacidity | ناترشێتی. |
| لا حلمة | Athelia | بێ گۆیی ؛ نەبوونی گۆی مەمك. |
| لا حراري | Athermic | بێ گەرمی ؛ نەبوونی گەرمی |
| لا حمي | Apyrexia | بێ تایی ؛ نەبوونی تا. |
| لا حركية | Akinesia = akinetic | بێ جووڵەیی. |
| لاحظة - لواحظ - عين | Eye | چاو. |
| لاخطو | Abasia | نەبوونی توانایی رۆیشتن. |
| لا خلوي - غير خلوي | Acellular | ناخانەیی - بێ خانەیی. |
| لاذع - محرق | Burning = pungent = Biting = peppery = acrid | توون - تیژ |
| لاذن = قسـتوس - قسطوس شقواص | Gwm cistus = ladanum vesintree = cistus | سیستوس) دەوەنێکی ناوی هەمیشە سەوزە گوڵەکەی پان و پەمبەیی یان سپییە لەناو پێشەلاندا دەروێت. |
| لاذن = لادن= علك اللبان | Ladanum = Gum ladanum chewing gum | لادن - لادانم - لابدێنیم ؛ مادەیەکی زەمقی ریسێنی پزیشکی بۆن خۆشی رەش و سپی مەیلەو قاوەییە بۆ مەبەستی دەرمان و عەتر بەکاردێت لە رووەکی سیستوس دەردەهێنرێت، (بنێشت). |
| لاذوب | Insoluble = unsoluble | ناتوێتەوە ؛ بۆ نموونە بەرد لە ئاودا ناتوێتەوە. |
| لاذنبيات - بتراوات | Anura | بێ کلکەکان ؛ گیاندارە بێ کلکەکانی وەکوو بۆق. |
| لار - جبون لار | Lar | (لار) جۆرە مەیمونێکی دەست درێژو سپییە. |
| لارج | Larch | (لارچ) تەختەیەکی قـاوەیی مەیلـەو زەردی قورسە بـۆ فەرشی ناو ژوورو تەختەی ژێر هێڵی ئاسن بەکاردێت. |
| لاريشيات - عديمات الريش | Impennate | بێ پەڕەکان ، ئەو باڵندانەی کە پەڕیان نییە وەکوو پێنگوین. |
| لارؤية | Ablepsy | نەبینین. |
| لاريكس - ملز - ارزية | Larix = larch | (لاریکس) درەختێکی گەورەیە لە کۆمەڵەی سنەوبەر بۆ رازاندنەوەی باخچەکان بەکاردێت، بەرەکەی قوچەکییە، تەختەکەی قاوەیی و رەقە، توێکڵەکەی بۆ دەباغ کردن بەکاردێت و لە قەدەکەی مادەیەکی رێسینی باش دەردەهێنرێت. دەرمانی بەڵغەم فڕێدانی وورپاکردنەوەو قەبزکردنی لێ دەردەهێنرێ. |
| لازورد | Lazurite = Lapis-lazuli = ultra marine = Armenian stone | (لازوریت) - لاجیوەرد؛ مەعدەنێکە لە سۆدیۆم و کالیسیۆم و ئەلەمنیۆم و سلیکۆن و ئۆکسجین و گۆگرد پێك هاتووە، بە شێوەی بلوور هەیە بەردێکی بە نرخی روونی شینی مەیلەو سوور یان سەوزە بۆ دروست کردنی ملوانکەو بەرمووروو بازن بەکار دێت هەروەها رەنگێکی شینە لە بۆیەی رووکەش کردندا بەکار دێت. |
| لازوردي | Cervlean = Azure blue | لاجیوەردی، رەنگێکی شینی ئاسمانی. |
| لازوليت | Lazulite | (لازولایت) مەعدەنێکە لە جیوەرد دەچێت بریتییە لە فۆسفاتی ئاویی مەگنیسیۆم و ئاسن و ئەلەمنیۆم ، رەنگەکەی لە جیوەردی تێر یان سەوزی مەیلەو شینە بەردێکی نیمچە بە نرخە. |

| | | |
|---|---|---|
| لاذقاني | Latakia | (لاتاكيا) ، جۆرێكی نایابە لە تووتن. |
| لازهريات = ستورات الزهر | Sporophytes = cryptogams | بێ گوڵەكان - گوڵ شاراوەكان ، وەكوو رووەكی سەرخەس و قەوزە گڵەوەز (طحلب) وقارچك. |
| لازوريت | Lazurite | (لازوریت)؛ بریتی‌یە لە كەرەسەی خاوی لاجیوەرد(ئەلترامارین)ی شین بە شێوەی بلووری خشتەكی لە سلیكاتی سۆدیۆم و ئەلەمنیۆم و كەمێك گۆگرد پێكهاتووە یەكێكە لە پێكهێنەرەكانی مادەی لاپیس لازولی. |
| لازب = ثابت | Firmly fixed | جێگیر. |
| لاسلكي | Wireless | بێ تەل - رادیۆ ؛ دەزگایەكە توانایی ناردنی نامەی هەیە بۆ ماوەیەكی دوور بەبێ بەكارهێنانی تەل، بێ سیم. |
| لاستيك = مطاط | Elastic | لاسیق ، لاسیك |
| لاسع | stinging = Blting | پێوەدەر = چزوودار |
| لاسلاميات = كزم | A phalangia | نەبوونی هیچ، نەبوونی ئێسكی پەنجە. |
| لاساقي - عديم الساق | Acaulous | بێ قەد = رووەكێك قەدی ئاشكرای نەبێت. |
| لاسمي | Atoxiz | بێ ژەهری. |
| لاسوي - شاذ | Abnormal | نائاسایی |
| لاسر | Laser | (لاسەر) زەمقێكی رێسینی (راتنجی)یە لە گیایەكی تایبەتی دەردەهێنرێت لە مەعدەنووس دەچێت بۆ مەبەستی پزیشكی بەكار دێت |
| لاسيكس | Lasix | (لاسیكس) ؛ دەرمانێكە بۆ چارەكردنی هەندێك لە نەخۆشی‌یەكانی دڵ و زیادكردنی دەرهاوێشتنی میز و ئاو و خوێ لە لەشەوە. |
| لاشفة | Acheilia | بێ لچی - بێ لێوی. |
| لا شعور | Subconscious = uncoscious = unconscious = athy mia | نەست = بێ هەستی - بێ هۆشی. |
| لا شكلي | Amorphous = non-srystaline | ناكریستاڵی - نابلووری ، رەوشتێكە بۆ ئەو مەعدەن و كەڤرانەی كە شێوەیەكی بلووریی تایبەتی‌یان نی‌یە. |
| لا شكلية -لا بلورية | Amorphia = amorphism | نابلوورێتی. |
| لا شيء | Nothing | هیچ - پووچ. |
| لا شبع | Acoria | تێرنەبوون. |
| لا شفافية = عتامة | Opacity | ناڕۆشنی - تەڵخی ، هەر مادەیەك نەهێڵێت رووناكی پیادا تێپەربێت. |
| لا شوكي = عديم الشوك = املس | Inermous | بێ درك - ساف و لووس - ساف |
| لاشة | | جۆرە ماسی‌یەكە لە دەریای مانش دەژی. |
| لا شمية | Anosmia | بێ بۆنكردن، نەبوونی هەستی بۆنكردن. |
| لاصف = براق -متلألىء | Fluorescent | بریسكاوە - درەوشاوە. |
| لاصف | Plantain | (راجع لسان الحمل). |
| لاصـــــف- فلوريـــــد (الكالسيوم) = فلوريت | Fluorspar = Fluorite | (فلۆرسپار) فلۆرایت ، مەعدەنێكی بلووری رۆشنە لە شلەوە كردنی مەعدەنەكان و درووست كردنی شووشەدا بەكاردێت. |
| لا صوتية = فقد الصوت | Aphonia | بێ دەنگی - وون كردنی دەنگ ، لە ئەنجامی ئیفلیجی‌یەك لە ژێیەكانی دەنگ دا. |
| لا صفراء | Acholia | بێ زراوی = نەبوونی زراو. |
| لا صوق = لا زوق | Cataplasm = plaster | لەزگە - پلاستەر. |

| | | |
|---|---|---|
| لاطيء | Sessile | بێ لاسك = بێ قنچك ، وەك ئەو گەڵایەی کە لاسکی نییەو راستەوخۆ بە لقەکەوە نووساوە. |
| لاطفيلي = غير طفيلي | Non parasitiz = non parasitic | نامشەخۆر. |
| لاطس = لاتس - حمار البحر - فرخ نيلي | Lates = Great Nile Perch | لاتیس ، جۆرە ماسی‌یەکی رووباری گەورەی پشت کۆمە. لە رووباری نیلدا دەژی. |
| لا ظفرية | Anonychia | بێ نینۆکی. |
| لاعي | Sur spurge | شیرمار - شیر خوژیلك ، دەوەنێکە گوڵێکی زەردی بۆن خۆشی هەیە. |
| لاعية = حلبلاب | Sun spurge = wart wort = lop hospermum | کارەوو = هاز = پیازە خووگانە؛ جۆرێکە لە رووەکی شیرمار رووەکێکی کەپرییە گوڵەکەی گەورەیە پەمبەیی مەیلەو سپی‌و زەردە هەنگی تێ دەوروکێت. |
| لا عقدي | Aganglionic | بێ گرێیی |
| لا عدسة | Aphakia | بێ زەرەبینی ، نەبوونی زەرەبینی چاو . |
| لا عضوي = غير عضوي | Inorganic = un organic | نا ئەندامی ؛ وەك هەندێك مادەی کیمیایی وەك خوێی چێشت. |
| لاعب | Player | یاریکەر. |
| لاعب الغولف | Golfer | ئەو کەسەی یاری گۆڵف ئەکات. |
| لاعب على الحبال- بهلوان | Rope dancer = acrobat | تەناف باز ، ئەوانەی لەسەر پەت یاری ئەکەن. |
| لاعق - لاحس | Lap = lick | لێسەرەوە |
| لاغون | Lagoon | لاگون ، گۆمێکی قەراغ دەریا. |
| لاغمة | Agromyzide = leaf miner | مێروویەکی خۆڵەمێشی زیان بەخشە بە رووەك. |
| لافتة - يفطة | Motto = emblem = sign-board | یافتە - دروشم = لافیتە |
| لافح - لفوح - محرق | Scorching = blasting | سوتێنەر - هەڵقرچێنەر |
| لافيولوز | Laevulose | لاڤیولۆز؛ ناوێکی کۆنە بۆ شەکری فرکتۆز. |
| لافلز | non-metal | ناکانزا؛ جۆرە توخمێکی کیمیاییە ، بێ بریسکەیە ، وەکوو گۆگرد. |
| لافقري = عديم الفقرات | Invertebrate | بێ بربرە ، گیانداری بێ بربرە وەکوو کرم‌و مێروو. |
| لافك | Agnosia | بێ شەویلگە. |
| لافكيات | Aganthus | بێ شەویلگەکان ، کۆمەڵەیەکن لە ماسی وەکوو ماسی لامپری. |
| لافينيت | Laavenite | (لاڤینایت) یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی کانزای زرکۆنیوم، مەکنیسیۆم‌و کالیسیۆم ، مەنگەنیزیشی تیادایە، رەنگەکەی لە نێوانی زەردو بۆرو رەشدایە. |
| لاقط الصوت - لاقط | Pickup | پیك ئەب - دەنگ گر - دەنگ وەرگر، دەزگای گۆڕینی دەنگ‌و رەنگ بۆ نیشانەی کارەبایی وەکو لە مایکرۆفۆندا. |
| لاقدمية - لا قدمي | Apodia =apodal | بێ پێی = بێ قاچی بێ پێ ، وەك مار. |
| لا قراءة - عمى قرائي | Alexia | نەخوێنەوە؛ پشێوییەکە لە مێشکدا ئەو کەسە توانای خوێندنەوەی نابێت. |
| لاقحة - خلية مخصبة - بيضة مخصبة | Zygote | (زایگۆت) ، خانەیەك یان هێلکەیەکی پیتێنراو. |
| لا قطبي | Apolar | ناپۆلی ؛ ناجەمسەریی. |
| لاقم البكتريا - اكل البكتريا | Bacteriophage | بەکتریاخۆر. |
| لاكون= لاغون - هور | Lagoon | (لاگوون) ؛ زەلکاوێکی تەنکاوە جار ناجارێك بە دەریاوە دەنووسێت یان لێی جیا دەبێتەوە. |
| لاكية - لك | Lacquer | لۆك = مادەی لۆك. |

| | | |
|---|---|---|
| لاكتابة | Agraphia | نەنووسین. |
| لاكتات - لبنات | Lactate | خوێی لاكتات ؛ ترشی ماست(لاكتیك). |
| لاكتات الامونيوم | Ammonium lactate ($NH_4C_3H_5D_3$) | لاكتاتی ئەمۆنیۆم ؛ شلەیەكی بێ ڕەنگ یان مەیلەو زەردە. |
| لاكتات الكالسيوم | Calcium lactate Ca ($C_3H_5O_3$) $5H_2o$ | لاكتاتی كالسیۆم ؛ تۆزێكی سپی بە زۆری بێ تام و بێ بۆنە؛ لە بواری پزیشكی و پیشەسازی خۆراك و مەیدا بەكاردێت. |
| لاكتيز | Lactase | لاكتەیز، ئەنزیمێكە بۆ گۆڕینی شەكری لاكتۆز بۆ گلوكۆز و لاكتۆز. |
| لاكتوز | Lactose | لاكتۆز - شەكری شیر؛ شیر (دوای لابردنی سەرتوێژەكەی) دوای هەڵماندنی لاكتۆزی لێ پەیدا دەبێت لاكتۆز بە ڕێژەی ٥٪ لە شیری مانگا و ڕێژەی ٧٪ لە شیری دایكدا هەیە. |
| لاكتومتر | Lactometer | لاكتۆمەتر، شیرپێو- ئامرازی پێوانی خەستی شیر. |
| لاكوليت - كتلة مقحمة | Laccolith= Laccolite | (لاكولیت) ؛ تۆیەڵە بەردێكی ئاگرین لە گرایت دا كە لە شێوەی گومەزدا بێت |
| لاكوليت مائي | Hydro laccolith | لاكولیتی ئاویی . |
| لاكفاية | Incompetence | ناتەواوی. |
| لالنكي - يوسفي - يوسف افنـدي - مندرين | Mandarin orange = loose skinned orange = tangerines = Italian tangerine | لالەنگی- خۆش داكەنە - خۆش پاكەرە - نارەنگی درەختێكە بەرەكەی لە بەری پرتەقاڵ دەچێت بە ئاسانی پاك دەكرێت. |
| لا لا عباس - حلق السبع الأفريقي - حنك السبع | Four Oclock plant= Marvel of peru | لا لۆعەباس - لالە عەباس - گیایەكی بەرزە گوڵی هەمەڕەنگ دەگرێ.. زەرد و سوور و سپی؛ بەرەكەی وەكوو دەنكی ئاڵەت ڕەشە. |
| لألأة=لمعان | Shine = Glitter = Brilliancy = Twinkling | درەوشانەوە. |
| لالعابية | Aptyalism | بێ لیكی - نەبوونی لیك. |
| لالوني | Achromatic | بێ ڕەنگی. |
| لال - لعل - بلخش | Balas = balas ruby | لەعل - بەردێكی بە نرخە. |
| لالة | Trillium | لالە؛ گیایەكە لە كۆمەڵەی زەمەق قەدەكەی كورتە گەڵاكەی سپی یان .. یان پەمبەی یان سەوزی مەیلەو زەردە. |
| لالانج | Lalang | لالانگ |
| لامة | Collect | كۆكەرەوە. |
| لامة | Wound wort | پەنجەشێر - قاتران ، جۆرە گیایەكە. |
| لامحة - ملامح | Feature | سەروسیما - شێوە |
| لا مائي | Anhydrous | ئاناویی ؛ ئەو مادانەی كە ئاویان تیادا نییە یان ئاوەكەیان لێ لابراوە وەكوو گۆگرداتی مسی شین، كە ئاوەكەی لێ لابرا سپی دەبێت. |
| لامـا - لامـة - جمل امريكي | Llama | (لاما)؛ گیاندارێكی شیردەری سمداری كاوێژكەرە، لە ووشتر دەچێت بەلام بچووكترە، دووگی نییە، لە باشووری ئەمریكادا دەژی ، بۆ ڕاكێشان و باركردن بەكاردێت، پێستەكەی بە نرخە و سوود لە خورییەكەی وەردەگیرێت. |
| لامع - براق | Shining = flashing = glittering | بریسكەدار = درەوشاوە - درەخشان. |
| لامعة - فوتينية | Photinia | بریسكەدار (فۆتینیا) درەختێكە لە كۆمەڵەی گوڵەباخ گەڵاكەی دەبریسكێتەوە، بۆ ڕازاندنەوەی باخچەكان بەكاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لامعة = يافوخ الطفل | Fontanel | ئێسکی سەری منداڵی ساوا کە نەرمە لە پێشدا. |
| لامعات | Ganoids | بریسکەدارەکان: جۆرێکن لە ماسیە کرکراگەدارەکان وەکوو ماسی ستەرجیۆن. |
| لا مفصلي - غير متفصل | Inarticulate | ناجومگەیی ، ناجومگەداری. |
| لامبالاة | Apathy= adiapherla | کەمتەرخەمی |
| لا مبيضية | Ano varium | بێ هێلکەدانی |
| لا مقلة | Anophthalmia | نەبوونی گلێنەی چاوو. |
| لامس - لامسة | Tentacle = feeler | شاخی هەست کردن - داوی هەست کـردن - قۆچی هەسـت ، وەکـوو لـە هەندێك گیانداردایە. |
| لامبري = لمبري- جلكي - جلكا | Lamprey= petromyzon | (لامپری) ماسی‌یەکی کرکراگەیی دەم بازنەیی، بێ شەویلگەو بێ پەلو بێ پوولەکەیە ، لەشەکەی لوولەیی‌یە لەمار دەچێت پێستێکی لووسی هەیە. دەمی دەنوسێنێت بە لەشی ماسی ترەوەو خوێنەکەیان دەمژێت. |
| لاميـون- لوقـاس - قراص كاذب | Lamium = Dead nettle | (لامیۆم) - گەزنە درۆزنە ، گیایەکە لە شوێنی سێبەردا دەروێت هەندێك بۆ لەوەڕ هـەندێکی بـۆ مەبەسـتی پزیشـکی بـەکاردێت ، گوڵەکـەی گـەورەو سپی‌یە یان ئەرخەوانی یان زەردە. |
| لامتبلور - غير متبلور | Amorphous | ناکریستاڵی - نابلووری؛ هەرمادەیەك یان مەعدەنێك بە شێوەی بلوورنەبێت. |
| لا موصـل = غـير موصـل - عازل | Non-conductor | ناگەیێنەر ؛ مادەیەکە ناهێڵێت جۆرەکانی ووزەی گەرمی و کارەباو دەنگی پیا تێپەڕ بێت وەکوو لاستیك. |
| لا مشبع - غير مشبع | Unsaturated | ناتێر ، سیفەتێکە بـۆ گیراوەیـەك کـە بتوانێـت بڕێکـی تـر لـە تواوەکـە وەربگرێت لە پلەیەکی گەرمی تایبەتیدا. |
| لا مستقر - قلق-غير مستقر | Unstable | ناجێگیر- سیفەتێکە بۆ ئەو ئاوێتە کیمیایی‌یەی کە پاش دروست بوونـی خێراش دەبێتەوە بۆ دوو مادەی تر یان زیاتر یان توخمێك کە پێکهاتنەکەی یان شێوەکەی بگۆڕێت بۆ بارێکی تر وەکوو ئۆزۆن بۆ ئۆکسجین |
| لا متماثل = غير متماثل | Asymmetrical | نا لەیەك چوو - لەیەك نەچوو ، گیاندارێك لە یەکتری نەچن وەکوو ئەمیبا. |
| لا متجانس = غير متجانس | Heterogenous | ناچوون یەك، بۆ نموونە ئەگەر قاپێك گیراوەیەکی ئاوی تێر خوێی تیادا بێت لە سەرەوە و لە ژێرەوەش بڕێك خوێ لە بنی قاپەکەدا هەبێت. |
| لا ماركية | Lamarckism | (لامارکیزم) ؛ بیروڕای زانالامارك دەربارەی گەشەکردنی ئەندامی (التطور العضوي) دەقەکەی دەڵێت : کەوا هەموو گۆڕانێك لە ژینگەدا، گۆڕانی لە لەشـی گیـاندارو رووەکـەکاندا پـەیدا دەکـات، ئـەم گۆڕانانـەش بـەرەو وەچەکانیان دەگوێزرێنەوە. |
| لا متساوية الأجنحة | Anisoptera | باڵ نەیەکسانەکان وەکوو مێرووی پووشکە بە قنگە. |
| لا منوية | Aspermia | نەبوونی سپێرم، نەبوونی سپێرم لە (شاوەتی) ئاوی پیاودا. |
| لامـوس - (لمنـج) = ليمينك - لمنجو | Lemming | (لیمینـگ) گیاندارێکی قرتێنـەری کلـك کورتـە لـە بـەرازی غینیـا دەچێـت توانای مەلەکردنی هەیە، لە نەرویج دەژی کە ژمارەیان لە شوێنێکدا زۆر دەبێت هەندێکیان بۆ شوێنێکی تر کۆچ دەکەن، رەنگەکەی خۆڵەمێشی یان سووری مەیلەو قاوەیی‌یە. |
| لامي - امريد | Amyride | (امریس) دەوەنێکە جەوی‌یەکی باشی لێ دەردەهێنرێ |
| لامـي (عظـم لامـي) - عظم قاعدة اللسان | Hyoid bone = tongue bone | ئێسکی لامی = ئێسکی بنی زمان ئێسکێکە لە شێوەی پیتی (د) دایە. |
| لامية | Lame | (لامی) ، قوماشێکە دەزووی مەعدەنی تیادایە |

| | | |
|---|---|---|
| لامبرت | Lambert | (لامبێرت) = یەکەی سپێتی ڕووناکی ؛ یەکەی پێوانی شەوقدانەوەی ڕووی مادەکانە، بریتی‌یە لە ١ مۆم بۆ هەریەك سانتیمەتر چوارگۆشە. |
| لا نهاية، اللامتناهي، اللامحدودية | Infinity | هەر بڕێك لە سنووری خۆی پتربێت نیشانەکەی (∞) بێ سنور، بێ کۆتایی. |
| لا نهائي، لا متناه | Infinite | بێ پایان - بێ کۆتایی - بێ دوایی - بێ پەڕ - بێ بڕانەوە. |
| لانتانا - ميناء شجري | Lantane = lantana | لانتانا - درەختی مینا ؛ دەوەنێکە نزیکەی (٢) مەتر بەرزدەبێتەوە وە گوڵەکەی لە گوڵی مینا دەچێت، زەرد یان پرتەقاڵی‌یە. |
| لانولين | Lanolin | (لانۆلین) بەزی مەڕ - پیوی مەڕ - ڕۆنی خوری ؛ مادەیەکی چەوری زەردە لە خوری دەردەهێنرێت، لە دروست کردنی مەڵحەم و دەرمانی ئارایشت و ڕۆنی مەکینەو سابوندا بەکاردێت. |
| لانيكور | Lanicor | (لانیکۆر) ؛ دەرمانێکە بۆ چارەکردنی پەك کەوتنی دڵ بە شێوەی دەرزی و حەب هەیە. |
| لانوكسين | Lanoxin | (لانۆکسین)، دەرمانێکە بۆچارەسەرکردنی پەك کەوتنی دڵ بە شێوەی دەرزی و حەب هەیە. |
| لانجور - هانومان - قرد | Langur | (لانگور) ؛ مەیمونێکی کلك داری دڕندەی زیان بەخشە بە کشتوکاڵ. |
| لانثانيوم - لانثانوم | Lanthanum | (لانثانیوم) ؛ توخمێکی کیمیایی‌یە کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (١٣٩) ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٥٧)، کانزایەکە ڕەنگەکەی خۆڵەمێشیە نیشانەکەی (La). |
| لانثانيدات = عناصر ارضية نادرة | Lanthanides | (لانسانیدەکان) توخمە زەوی‌یە دەگمەنەکان ، بریتی‌یە لە (١٥) توخم کە ژمارەی ئەتۆمیان لە نێوانی (٥٧ ٧١) دایە وە بە لانسانێوم دەست پێ دەکات لە ڕەوشتی کیمیایی‌دا لە یەك دەچن کەوتونەتە ڕیزی سێ‌هەم لە خشتەی خولیدا. |
| لا نغلي | Langley | (لانگلی) ؛ یەکەی پێوانی تیشکی خۆر. |
| لا نقطية استكماتزم | Astigmatism | (ئەستیگماتیزم) ؛ نەنگیەکە لە بینیندا، چونکە ئەو تیشکی ڕووناکی‌یانەی کە دەچنە چاوەوە، لەیەك خاڵدا کۆنابنەوە لەبەر ئەوە بینینی بە شێوەیەکی ڕێك و پێك نابێت. |
| لانغبينيت | Langbeinite | (لانگبینایت) ؛ مەعدەنێکە لە گۆگرداتی مەگنیسیۆم و پۆتاسیۆم پێك هاتووە، لە دروست کردنی پەییندا بەکاردێت. |
| لا نسول | Improcreant | بێ وەچە - وەجاخ کوێر. |
| لا نطق = فقدان النطق | Alalia | بێ نوتقی - بێ بێژەیی |
| لا نووي | Anuclear | بێ ناوکی. |
| لا نفس -انقطاع النفس | Apnea = opnoea | بێ هەناسەیی - وەستانی هەناسە. |
| لا ندو | Landau | (لاندوو) = عەرەبانەیەکی کەشخەی چوار ئەفەری‌یە. |
| لا هوائي | Anaerobe = anaerobic | ناهەوایی = بێ هەوایی ، هەر زیندەوەرێك بەبێ هەوا هەناسە بدات وەکو لە هەندێك بەکتریادا. |
| لاهار - انهيار طيني بركاني | Lahar | (لاهار) داڕووخانی قوڕی گڕکانی. |
| لا هوائية | Anaerobic | بێ هەوایی، سیفەتێکە لەو گیاندرانەدا کە دەتوانن بەبێ هەوا هەناسە بدەن. |
| لاهبة = ملهاب | Flame thrower | گڕەوەشێن = ئامرازێکە گڕ دەوەشێنێت، بۆ لەناوبردنی مێروو بەکاردێت. |
| لاونطة = لاوندة - خزامي = خيري البر | Lavender = spike | لاوەنتە -گوڵە عەزیم = لالە = بەرز لنگ - چاران چەقیلە = گیامسك - گیایەکە بۆنێکی خۆشی لێ دەردەهێنرێت. |
| لاوعي | Sub conscions | بێ هۆشی = بێ ئاگایی - ڕاز. |

| | | |
|---|---|---|
| لاورقي - عديم الورق | Ophyllous | بێ گەڵا - وەکوو ڕووەکی سوێر. |
| لا وعائي | Avascular | بێ بۆڕیی. |
| لايبيز - ليباز | Lipase | (لایپێز) ؛ ئەو ئەنزیمەی کە چەوری دەتوێنێتەوە لە لەشدا بۆ ئاسان کردنی هەرس. |
| لايدين | Acheiria | بێ دەستی = نەبوونی هەردوو دەست. |
| لايسوســـــــوم - لايسومات | Lysosomes = Lysomes | لایسۆسۆم = لایسۆمەکان - تەنە شـی کـەرەوەکان؛ دەنکێکـی تورەکـەیی زۆر بچووکە لە خانەی لەشی زیندەوەردا هەیە، یارمەتی هەرس کردن‌و لەناوبردنی خانە مردووەکان دەدات. تەنها بە مایکرۆسکۆپی ئەلیکترۆنی دەبینرێت. |
| لا يصلح لا اكل - لا يؤكل | Inedible | ناخورێت؛ هەرشتێك کە نەخورێت. |
| لاينوتيب - منضدة سطرية | Linotype | لاینوتایپ، تیپ ڕێژ، مەکینەیەکە بۆ ڕیزکردنی پیتی چاپ لە دێری داڕێژراودا. |
| لايدا - لايدة | Lyda | لایدا؛ مێرویەکی باڵ پەردەیی‌یە ، مێتولکەکەی زیان بە درەختی بەردار دەگەیەنێت. |
| لايت ساسك | Light sassex | لایت ساسێکس - جۆرە مریشکێکە . |
| لب - لباب = قلب | Pith = pulp = marrow = core = Essemce = heart | کرۆك = کێرۆك - کاکڵە = ناورك - کولاف - قەوارۆك - ناوەرۆك -ناواخن = دڵ - جەرگە. |
| لبي | Pulpal | کرۆکی ؛ بە هەر شتێك دەوترێت پەیوەندی بە کرۆکەوە هەبێت. |
| لب الثمر = شحمته | Marrow = pulp = pith | کاکڵەی یان کرۆکی بەر. |
| لب الثمرة | Mesocarp | کاکڵەی بەری میوە = ناووکی بەری میوە. |
| لب النارجيل - كبرة | Copra | (کۆپرا) کاکڵەی بەری گوێزی هیند کە باشترین جۆری ڕۆنی لێ دەردەهێنرێت. |
| لب بني | Internal browning | کرۆکە قاوەیی ، نەخۆشی‌یە کە دەدات لە بەری سێوی هەڵگیراو لە عەماردا دەبێتە هۆی ترشانی. |
| لب الأرض - نواة الأرض | Centero sphere = Core of the earth | کرۆکـی زەوی - ناوجەرگـەی خڕۆکـی زەوی کرۆکەچـەقی یەکـەی تـەنی زەوی لـەژێر بەرگـە کەمژێنەکـەدا ، لـە قوڵایـی (٢٩٠٠) کیلۆمەتردایـە، لـە ئاسن‌و نیکل پێکهاتووە. |
| لب خشب ميكانيكي | Mechaanical wood pulp | کرۆکی میکانیکی بۆ دروست کردنی کاغەز. |
| لب خشب كيميائي | Chemical wood pulp | کرۆکی تەختەی کیمیایی بۆ دروست کردنی کاغەز |
| لب الخلية - بوبين | Bobbin | کرۆکی خانە، شیشی گرافیت بە هەوێرەکەی دەوروپشتیەوە لە ناوەڕاستی پیلی کارەبادا. |
| لب البذرة | Kernel | کرۆکی تۆو - ناڤك |
| لب الجوز واللوز | Kernel | هەژگە؛ کاکڵە گوێزو بادەم. |
| لباد | Felt = matted wool | لبادە = کورك - فەرمەنجی - کەپەنك - لوا- بەرگن - نەمەد - ڕاخەرێکە لە خوری بەبێ تان‌و پۆ تەنها بە سوونەوە درووست دەکرێت. |
| لبادة السرج | Numdah = nammad | لبادەی زین‌وی وڵاخ. |
| لباد | Felt maker | کارگەچی - موتاورچی - موتابچی |
| لبادي - ذعرة = ابو فصادة | Wagtail | شوان خەڵەتێنە ، جۆرە باڵندەیەکە هەتا هەڵی نەفڕێنێت نافڕێت. |
| لبان | | (١) بنێشت - بخورد - بفورد، (٢) درەختی قەزوان یان بخورد. |
| لبان = بائع الحليب | Milk man | شیر فرۆش. |
| لبـــان هنــــدي - كنـدر - بسـيج - بخور - لبان ذكر | Frankincense = Olibanum tree = boswellia-carterii = incense | بخورد = جۆرێکە لە بخورد ؛ ڕووەکێکی کێوی دڕکاوی بچووکە لقەکـەی بریندار دەکرێت جۆرە کەتیرەیەکی بۆن خۆش دەردەدات پێی دەوترێت بخورد. |

| | | |
|---|---|---|
| لبان حبشي - طوس | Incense | ئینسێنس ؛ جۆرێکە لە داری بخورد درەختێکی بچووکە لە حەبەشە دەروێت بە قلیشاندنی قەدەکەی بخورێکی نایاب دەست دەکەوێت. |
| لبان جاوي - میعة | Benzoin | بینزوئین - جەوی ؛ جۆرە جەوی‌یەکی بۆنخۆشە لە هەندێك درەختەوە دەردەدرێت، لە دروست کردنی عەترو لە پیشەسازییدا بەکاردێت. |
| لبـان شـامي = صمغ البطم | | بنێشت - مادەیەکی رێسینی زەمقیە لە قەدو لقی داری قەزوان (دارەبەن) دەردەهێنرێت. |
| لبانـة شـامیة - قلفونیة | Rosin = resin = colophony | قەلفۆنیە ؛ مادەیەکی زەردی رەقە لە ئەنجامی هەڵماندنی تەربەنتینەوە، پەیدا دەبێت ژێی کەمانچەو بنی پێلاوی پێ چەوردەکرێت. |
| لبانة | Echter burgel | گیاو دەومەنێکە ، قەدەکەی قیتە، گوڵەکەی وردە ، بەرەکەی لە توورەکە دەچێت. |
| لبان | Brick maker | خشت کار- خشت فرۆش - خشت بڕ؛ ئەو کەسەی خشتی کاڵ دروست دەکات. |
| لبایة - امطي | Elemingum tree | درەختێکە لە کۆمەڵەی بخورد گەلاکەی ئارێتەیە گوڵەکەی سپی وردە ئاوگێکی زەمقی رێسینی رۆنی بۆن خۆش لە قەدەکەی دەردەهێنرێت وەکوو بخورد بەکاردەهێنرێت. |
| لباس - زي | Drawers = dress = garb = guise | جل - جل‌و بەرگ - پۆشاك |
| لباس المرأة | | جلی ژنانە - پانتۆڵی ژنانە - پانتۆڵی کورت. |
| لباس الرجل | Pants = under pants | جلی پیاوان. |
| لباس السهرة | Evening dress | جل‌و بەرگی شەو - جل‌و بەرگی ئاهەنگ ، ئەو جل‌و بەرگەی کە بە شەو لە ئاهەنگ دا لەبەر دەکرێت. |
| لباس رسمي | Full dress = uniform | جل‌و بەرگی رەسمی - جلی بۆنە. |
| لبا | Beestings = Colostrum = Neogala | ژەك -فرچك - فریشك -خەڵپوت - خرندوڵ ؛ شلەیەکی زەردە لە مەمکی دایکەوە دێتەدەرەوە لە رۆژانی یەکەمی منداڵ بووندا، ئەگەر ژەکی یەکەم رۆژو دووەم رۆژی گوانی ئاژەڵ لێزێت تامەکەی شیرین دەبێت‌و دەبێتە فرۆ. |
| لبارز- ارز لبنان | Libocedrus | ئەرزی لوبنان ؛ درەختێکە بۆ رازاندنەوەی باخچەکان ، بۆنی تەختەکەی لە بۆنی ئەرزی لوبنان دەچێت. |
| لبانة | Dairy | پیشەسازی شیرو بەرهەمەکانی شیر، پیشەسازی شیرەمەنی‌یەکان. |
| لبان | Milk woman = Milk man = Dairy man | شیر فرۆش - ماست فرۆش. |
| لبائن | Mammals | گیاندارە شیردەرەکان وەکوو مەڕ. |
| لبائن كيسية - جرابيات | Marsupials | گیاندارە شیردەرە تورەکەدارەکان وەکوو کەنگەر - تورەکەیەك هەیە بەبەر سکیانەوە بێچووەکانی تێ ئەخەن. |
| لبائن مجنحة | Chiroptera = Flying mammals | گیاندارە شیردەرە باڵدارەکان وەکوو شەمشەمە کوێرە. |
| لبائن بيوضة | Egg-laying mammals | گیاندارە شیردەرە هێلکەکەرەکان وەکوو گیانداری دەنوکی مراوی. |
| لبائن مشيمية | Placental mammals | گیاندارە شیردەرە وێڵداش دارەکان وەکوو ئادەمیزادو مەیمون. |
| لبب | Martinagle | قایشێکە سەرێکی دەبەسترێت بە پشتێنی زینی وولاخەوەو سەرەکەی تری دوو لای (لقی) هەیە، بەناو هەردوو پەل پێشەوەی وولاخەکەدا تێپەڕ دەکرێن‌و دەبەسترێن بەسەر لووتی لغاوەکەوە. |
| لبت الجنين | Quickening | جولانەوەی کۆرپە لە سکی دایکیدا. |
| لبة - حساء | Pap = slops | لەپە - شۆربا. |
| لبة - قلادة | Gold necklace | ملوانکەی زێڕ. |
| لبة القلب - شرسوف | Epigustrium | سەروو گەدە؛ ئەو بەشەی کە کەوتۆتە سەروو گەدەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| لبتورة | Leptura | (ليپتورا) ؛ ميْروويەكى رەنگينى زيان بەخشە بە رووەك. |
| لبتوس | Leptus | (ليْپتۆس) ، مۆرانەيەكە شەش پەلى هەيە. |
| لبث، بقاء | Staying | مانەوە. |
| لبث - حماض الماء | Water dock = water sorrel | ترشۆكەى ئاويى، گيايەكە رەگەكەى سەلك دارە. |
| لبخ = تجصيص | Toplaster | شمشەكارى - سواخ - سواخ دان - تێ هەڵسوون بە گەچ. |
| لبخ - البيزيا = شجرة الحرير | Albizzia = lebbeck = Acacia lebbek = silk flower = siris tree = East Indian tree | (ئەلبيزا) دارئاوريشم - دارنوێنمەك؛ درەختێكى گەورەى دڕكاوييە كەلاكەى لە كەلاى گوێز دەچێت گوڵەكەى زەردو مەيلەو سەوزە بە شێوەى هێشوو بۆنێكى خۆشى هەيە بەرمكەى لە پاقلە دەچێت. |
| لبخة | Cataplasm = poultice | مڵەما - نوێنمەك - نيوەنمەك؛ پارچە قوماشێك هەوير يان ئارد يان تۆو كەتانى خوساوەى كوتراوى پێوميە دەخرێتە سەر لەش بۆ كەم كردنەوەى ئازار يان دەربوونى دومەڵ. |
| لبخة عيش - ثريد - فتة = فتيت | Sop = bread soaKed in soup | تريت - نانى تێ ووشراو. |
| لبد = لباد | Stuff made of matted wool = felt | بەڕەى خورى = لباد - نمەد - نەوە- تەو تاتى. |
| لبد | Matted wool | خورى مۆتاو كراو. |
| لبد - متلبد | Matted = tangled | پەنگ خواردوو. |
| لبدة الأسد | | يالى شێر . |
| لبدة | Wad | ئاواخن - پشك |
| لبدي - وبري | Tementous = downy | تووكن - تيسكن - كوڵكن. |
| لبس = التباس | Confusion | گومان. |
| لبتون | Lepton | لێپتۆن؛ پارچە دراوێكى يۆنانىيە، بەشێكە لە سەد بەشى پارەى دراخما . |
| لبسكس | Lobscouse | (لوبسكوس) ، خواردەمەنىيەكە لە گۆشتو سەوزە دروست دەكرێت. |
| لبس | Lobo | (لۆبۆ)؛ گورگێكى ئەمريكى گەورەيە. |
| لبسان = خردل بري - حرشاء | Snave = wild mustard charlock | خەرتەلە كێويلە ؛ گيايەكە لەناو كشتوكاڵدا دەروێتو زيانى پێ دەگەيەنێت. |
| لبطة - ركلة | Kicking | لەقە ، شەق |
| لبق | Skilful = Tactful | زمان ڕەوان = بە وێڵ - ڕەوشت جوان - شارەزا. |
| لبلبي | Roasted chick peas | برێشكەى نۆك - نۆكى برژاو - لەبلەبى. |
| لبلاب - لفلاف - عشقة = حبل المساكين | Laplove = Ivy = lablab bean = Hyacinth bean = Morning glory hedera Bind weed convolvulus | لاو لاو = لێلاقك - گوڵە سيانە - گيايەكى خۆ هەڵواسەرە گەلاكەى سێ پەلكە لە شێوەى زەنگدا گوڵى هەمەڕەنگى هەيە گيايەكى دەشتەكى و كشتوكاڵى يە هەندێكى بۆ مەبەستى پزيشكى بەكاردێت. |
| لبلاب بري = سقمونيا = محمودة | Bind weed = bear-bine | مالوێنچە.گيايەكە لە لاو لاو دەچێت. |
| لبلاب ارضي- كفنة مدادة. | Ground ivy = gill = earth ivy | لاولاوى زەوى؛ جۆرە رووەكێكە. |
| لبلاب بحري | Sea bells = sea bind weed | لاولاى دەريا ، جۆرێكە لە لاولاو ڕەقە لە كەنارى دەرياكاندا دەروێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لبلاب الحقول - طربوش الغراب | Corn bind = cornlily = bind weed | لاولاو ، گیایەکە گوڵی پەمبەیی‌یان سپی دەگرێت. |
| لبلاب مثلث الألوان - شب النهار | | راجع (شب النهار). |
| لبلاب مصري لوبياء لبلابية | Egyptian kidney-bean = hyacinth bean = lablab | لۆبیای میسری ، گیایەکی خۆ هەڵ واسەرە گەڵاکەی ئاوێتەو سێ پەلکە گوڵەکە ی وەنەوشەیی یان ئەرخەوانی‌یە بەرمکەی لە لۆبیا دەچێت. |
| لبن - حليب | Milk | شیر؛ شلاوێکی سپی‌یە مەمکی گیانداری مێ دەری دە دات بۆ بەخێوکردنی بێچووەکانی. |
| لبنات - لكتات | Lactate | لاکتات - خوێی ترشی لاکتیك - خوێی ترشی شیر یان ماست. |
| لبن نباتي | Vegetable milk = latex | (لاتیکس) - شیراوی ڕووەك ، شیراوێکی ڕنسینی‌یە خانەکان گەڵاو توێکڵی هەندێك ڕووەك دەری دەدەن وەکوو لە درەختی لاستیکدا. |
| لبن حامض - لبن رائب أو مروب | Curdled = milk yaourt | ماست - ماس. |
| لبن مكثف | Yaourt = yogurt = yoghurt | (یوگورت) - تۆراخ - خەستە - تۆراق = ماستی خەست - ماستاو. |
| لبن مجفف | Dried milk= MilK powder | شیری وشك. |
| لبن مقشد= لبن خاثر | Skimmed milk | ماستی بێ ڕۆن - چەقل ماست - چەوری‌یەکەی لێ لابرێت. |
| لبث خِض - خبيط | Butter milk | دۆ، ماستاو. |
| لبن زبادي - لبن حامض | Curdled milk | ماستاوی کوڵکن - ماستاوی چەور |
| لبن مقطوع - لبن مقطع | Whey | سیرێژ = شیرێژ |
| لبن اللبأ | Beestings | فرۆ مادەیەکە وەکوو ماست لە ژەکی ئاژەڵی تازە زاو دەمەیەنرێت بەبێ هەوێن تەنها بە گەرم کردن دوای ساردبوونەو دەمەیێت. |
| لبن الطير- صوصلاء - صاصل اشراس | Ornithogalum = chin-chin = milk star of BETHLEHEM | شیری باڵندە - گێلاخە - سرێش .گولاخ-ڕۆکا-کوزی (بە کوردی هەورامان) ڕووەکێکی سەلکدارە، (پیازۆکەیە) لە کۆمەڵەی شلێر، سرێش لە سەلکەکەی دەردەهێنرێت. |
| (لبن المغنيسيا) | Milk of mangnesia | شیری مەگنیسیا - گیراوەی هایدرۆکسیدی مەگنیسیۆم. |
| لبن الخشخاش | Poppy milk | تلیاك - باقور - بەنگ. |
| لبني | Lacteal = lacteous = lactic = milky | (١)شیریی - لاکتی ، هەر مادەیەك لە شیر پێك هاتبێت یان شیر بهێنێتە بەرهەم یان لە شیر بچێت یان شیری تیادا بێت.<br>(٢) ڕەنگی شیری. |
| لبني - لبنى عيهر - لبنى مسك - اصطرك - استرك - ميعة جامدة- ميعة ناشفة | Storax = styrax | (١)زەمقی شیرین= عەبەری وشك؛ جۆرە مادەیەکە لە توێکڵی ناوەوەی درەختێکی تایبەتی دەردەهێنرێت کە پێی دەوترێت (ئەستەرك) (ستۆراکس) (ستیراکس).<br>(٢) دەوەنێکە گەڵاکەی هێلکەیی گوڵەکەی زەردە جۆرە زەمقێکی لێ دەردەهێنرێت. |
| لبنية | Lactarius = milk mushroom | (لاکتاریۆس) قارچکەشیری ، هەندێك جۆری دەخورێت. |
| لبنية | | شیر برنج ؛ جۆرە خواردەمەنی‌یەکە لە شیرو ماستو برنجو گۆشت دروست دەکرێت. |
| لبن - لبن - طوب نيء | Adobe=cob = loam = sun dried bricks | خشت - خشتی کاڵ= کەرپووچ. |
| لبناز | Lactase | لاکتەیز: هەوێنێکە شەکری شیر دەگۆڕێت بۆ شەکری کلۆکۆزوگالا کتۆز. |

| | | |
|---|---|---|
| لبـــوس= تلبيســـة = للمستقيم - تحميلة | Suppository | شاف؛دەرمانی شاف. |
| لبوس (تلبيسة) للمهبل | Pessary | شافی گوڵینك - شافی مناڵدان. |
| لبوة - لبؤة = انثى الأسد | Lioness = she lion | دێڵە شێر - شێری مێ - شەپاڵ. |
| لبوج - قراد -طلح | Tick = Ixodes | گەنە. جۆرە مێروویەکە. |
| لبودي - نداف - حلاج | Cotton = Teaser = carder | هەلاج، لۆکە شیکردنەوە. |
| لبودة | Ceroplastes | جۆرێکە لە مێرووی قرمز زیان بە درەختی بەردار دەگەیەنێت. |
| لبون - حلوب | Milch = giving milk | شیردەر ، گیاندارێك شیری زۆر بێت. |
| لبونات ثدييات | Mammal = Mammalia | گیانداری شیردەر وەکوو کەروێشك. |
| لبيب | Intelligent = wise | زانا شارەزا - ژیر - دانا |
| لبين - انيسون | Anise | رازیانە، رووەکێکە لە کۆمەڵەی بەهاراتە. |
| لبيد | | راجع(كنهان). |
| لبيدة - بوصير - اذان الدب المخملي - بوصير مخملي الورق - كوكم | Verbascum = mullein | گوێ وورچە - گۆگەم - گوێ وورچەی مەخمەل - کوتەکی شوان گیایەکە قەدەکەی توکنە گوڵەکەی بنەوشەییە بەرەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| لبيدو | Libido | ئالۆشـی رەگـەزیی (زایـەندەیی)- (لیبیـدۆ) = رەمـەکی ؛ ووزەیـەکی دەروونییە لە پاڵنەرە (دوافع) بایۆلۆجییە سەرەتاییەکانەوە پەیدا دەبێت ، بە مەبەستی تایبەتییە. |
| لبيدات | Lipids | لیپیدس - مادە چەورەکان - رۆنەکان. |
| لبيدوليت | Lepidolite | (لیبیدۆلایت) ؛ جۆرێکە لە مەعدەن. |
| لبيدي | Libidinous | بە ئالۆشی رەگەزیی، کەسێك ئالۆشی رەگەزیی هەبێت دەوترێت. |
| لبين - لبين المروج - زغليلة - حشيشة - الحلمة - عشبة العلق | Anagallis = Red pimpernel | گیایەکی دەشتەکییە گەڵاکەی وورده گوڵەکەی سووری مەیلەو شینە زیان بە کشتوکاڵ دەگەیەنێت. |
| لبيس | Labeo | جۆرە ماسییەکی رەنگ قاوەیی دڕکاوییە. |
| لبيس -ثياب مستعملة | Second hand colthes | جلی لەبەرکراو - جلی نیوداشت - جلی لەنگە. |
| لبينة - لبين = خناق الديك | Spurge | شیرەمار - خوژێلك؛ رووەکێکە ئەگەر لق و گەڵاو گوڵەکەی بکەیتەوە شیراوێك دەردەدەن. |
| لبين - أم الحليب | Sowthistle | چاوبازە؛ رووەکێکە لە کەرتەشی دەچێت قەدەکەی دەخورێت. |
| لتر - ليتر | Litre = Liter | (لیتر)؛ گیترە - چارەکی گالۆنێك ؛ پێوەرێکە بۆ شلە ئەکاتە ١٠٠٠سم٣ واتە هەزار سی سی. |
| لتشية | Litche | (لیتشی) ؛ درەختێکی بەردارە لەپۆلی سابوونییەکان ، لە کەمەرەی زەوییدا دەروێت، بەرەکەی سووره ، بەقەدەر سێوێك دەبێت، دەخورێت و ئاوەکەی دەکرێت بە شەراب. |
| لتموس- ليتـمس | Litmus = turnsole | (لیتموس)؛ رەنگی دەنکی گوڵەبەرۆژە، پارچە کاغەزێکی تێ هەڵ دەکێشرێت، بۆ دۆزینەوەی مادە ترش و تفتەکان بەکاردەهێنرێت. |
| لتين - شبرق | Ononis = Rest harrow | گیایەکی دەشتەکییە لە کۆمەڵەی پاقلە مەنییەکان قەدەکەی خشۆکە رەگەکەی گرێدارە وەکوو تۆڕ وایە بە زەوییەوە دەنووسێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لث - مدبق | Clammy | شێدار- سارد و لینج. |
| لثام= برقع | Aveil | دەماخ = دەمامك دەماخ كردن بۆ خۆشاردنەوە، شاردنەوەی دەم و چاو. |
| لثاء | Vegetable Juice | ئاووگی درەخت وەكوو زەمق و جەوری. |
| لثاة - لثة - صمغ | Gum(of the teeth) = Gingiva | پووك- پدۆ - پدی- پەدو - پووكی ددان- پدوو -زەنی - هاروو. |
| لثاة، ليثة | Clethra | رووەكێكی دەشتەكییە بەشێوەی دارو دەوەن، گوڵەكەی بە شێوەی هێشووی بۆنخۆشە. |
| لثرمبج | Lithomarge | (ليتۆمێرج) قورێكی چینی خەستە. |
| لثوي | Gingival | پووكی، هەر شتێك پەیوەندی بە پووكەوە هەبێت. |
| لثط | | لێدان بە هێواشی = پیاكێشان بە سووكی. |
| لثغ - ألثغ | Stammerer = lisper | لاڵ- زمان پس - زمان گیریی. |
| لثـغ - فأفـأة - لثغـة - تمتمة - ماماة | Lisp = Stuttering = mutacism | لاڵی -زمان پسی - زمان گیری، پەپە پس. |
| لثق | Dew | شەونم - ئاورنگ. |
| لثم - تقبيل لثم | Kissing | ماچ كردن- راموسین - رامیسن. |
| لثي | Latex | شیراووگی رووەك؛وەكووشیراووگی درەختی لاستیك. |
| لثي | Mucilage | ولۆڵەی رووەكی؛ مادەیەكی ولۆڵەییە لە هەندێك رووەكدا هەیە وەكوو لە گیایە دەرياییەكاندا. |
| لجأة - سلحفاة - فاردة - غيلم - ترسة | Chelone = sea tortoise | كیسەڵی دەریایی گەورە هەندێك جار (٥٠٠ كیلۆ) دەكێشێت گۆشتەكەی دەخورێت رەنگی سەوز یان قاوەییە. |
| لجام | Ram | ئامرازێكی جەنگی كۆنە بۆ لێدانی كەشتی بەكاردەهات. |
| لجام الدابة - رسن | Bridle = frenum | جڵەو - پاڵەنگ - شیبە لغاو - لغاو - دەستە وسار - رەشمە- گەم - گەمك. |
| لجة - لج | Main sea | زۆربەی ئاوی دەریا. |
| لج (لجج) - لجاج = لجين | Silver | زیو ؛ كانزای زیو. |
| لجلجة | Stammering = paraphasia | زمان گیریی = زمان پسی. |
| لجنة | Commi ttee = Commission | لیژنە - كۆمیتە- كۆمەڵ = بتۆم - ئەلالەت |
| لجنة التقدير | Evaluation committee | لیژنەی نرخاندن - لیژنەی نرخ پێدان. |
| لجنة الضبط | Discipline committee | لیژنەی دابینی - لیژنەی دابین كردن. |
| لجنة تحقيقية | Commission of inquiry | لیژنەی لێكۆڵینەوە. |
| لجنين- خشبين | Lignin | (ليگنین)؛ مادەیەكی ئەندامییە لەگەڵ سلیلۆزدا پێكەوە تەختەی رووەك پێك دەهێنێت. |
| لجيم | Frenulum | لغاوێكی بچووك. |
| لجؤ | Rosorting | پەنابردن - دالدەبردن. |
| لجوح | Insistent | چاوقایم - كۆڵ نەدەر. |
| لجين - فضة | Silver | زیو . كانزایەكە. |
| لجيديوم | Lagidium | (لاجیدیۆم) ؛ گیانداریكی شیردەری قرتێنەرە لە كۆمەڵەی (شنشیلا) بە قەدەر كەروێشكێك دەبێت.گوێچكەكەی گەورەیە تیسكن و رەشە. |
| لحام - لحم | Soldering =welding | لەحیم كردن = لكاندن. |

| | | |
|---|---|---|
| لحام | Solder | لەحیم، دارشتەیەکە بە زۆری ی لە قورقوشم و تەنەکە پێك هاتووە پلەی شلەوەبوونی نزمە بۆ لکاندنی پارچەی کانزا بە یەکەوە بەکار دەهێنرێت. |
| لحام بالغاز | Gas welding | لحیم کردن بە گڕی گاز، وەك گڕی گازی ئۆکسی ئەسیتیلین کە تێکەڵاوێکە لە گازی ئۆکسجین و ئەسیتیلین. |
| لحام الأوكسجين | Oxy acetylene welding | لحیم کردنی کانزا بە بەکارهێنانی گڕی ئۆکسجین و ئەسیتیلین. |
| لحام بالقوس الكهربائي | Arc welding | لحیم کردن بە گڕی کەوانەی کارەبایی. |
| لحام بالمقاومة الكهربائية | Resistance welding | لەحیم کردن بە بەرهەڵستی کارەبایی، بەو گەرمییەی کە لە بەرهەڵستی دوو پارچە کانزا کە پەیدا دەبێت کاتێك کە تەوژمی کارەباییان پیادا تێپەڕ دەبێت. |
| لحام | Plumber | لەحیم کەر - لکێنەر - لەحیمچی - تەنەکەچی |
| لحام - جزار | Butcher | قەساب. |
| لحاد - حفار القبور | Grave digger | گۆڕ هەڵکەن. |
| لحاظ= مؤخر العين | Outer corner of the eye | تیلەی چاو -تیلای چاو ئەو بەشەی چاو کە نزیکە لە لا جانگەوە، گۆشەی چاو. |
| لحاف - اهاب - غشاء | Quilt = cover = Blanket = Tegmen = TEGMENTYM | لێفە - پێ خەف - بەرگ - پەردە. |
| لحاء | Bark = strip= rind= cortea=cortex | کەف - کەفێن - چینی ژێر توێکڵ لە قەدی رووەکدا. |
| لحائي | Cortical | کەفی. |
| لحاء داخلي | Phloem = bast | کەفی ناوەوە. |
| لحد | Grave = tomb | گۆڕ - قەبر. |
| لحس | Licking lapping | لستنەوە - لێسانەوە. |
| لحس الثدي - مص الثدي | Mammi lingus | مەمك لستنەوە - مەمك مژین. |
| لحظ العين - باطنها -ملتحمة | Conjunctiva | ژێر پێڵو ، ئەو پەردە تەنکەی کە لە ناوەوە پێڵوی چاوی داپۆشیوە. |
| لحظة | Moment = Instant | چرکە- پچەك - تاو -گاف - ترۆکە (خولەکێك٦٠ چرکەیە). |
| لحظة الموت | Articulo mortis = Moment of death | کاتی مردن. |
| لحظة - نظرة | Glimpse = Quick LooK = Glance | سەیرکردنێکی خێرا، چاو پیاخشاندنێکی خێرا. |
| لحكة - دساسة - حلكة - سحلية - رملية - لحكاء = لحكاة | Laceta = agilis = seps chalcides | مارمێلکەی لم؛ مارمیلکەیەکی بچوکی شینە خۆی لەناو لمدا دەشارێتەوە. |
| لحلاح - سورنجان - سورنجان الخريف - حافر المهر - اصابع هرمس - زعفران- المروج - عكنة- زعفران الخريف - مبشرة الشتاء | Colchicum = Meadow saffron = upstart = Fingers of Hermes = Autumn crocus = Naked sarcous | سورنجان- زەعفەرانی مێرگ - سورنجانە - پایزە - رۆست (rost) جۆتاروك (Jotaruk) گوڵوك جوتیان (Kuluk Jutyan) ، رووەکێکی ژەهرینە. |
| لحم | Meat = Flesh | گۆشت. |
| لحمي | Sacro- | پێشگرێکە بە مانای گۆشت. |
| لحمي- لحماني | Sarcoid = sarcous | گۆشتی ، هەرشتێك پەیوەندی بە گۆشتەوە هەبێت. |
| لحم بدون عظم | Flesh | گوڵمە - ولمە - نەرمە - گۆشت بەبێ ئێسقان. |

| | | |
|---|---|---|
| لحم - لحيم | Fleshy = corpulent | گۆشت دار. |
| لحم ابيض | White meat | گۆشتی سپی ؛ وەکوو گۆشتی باڵندەو ماسی. |
| لحم احمر = هبر | Lean (meat) | گۆشتی سوور. |
| لحم البقر | Beef | گۆشتی گاو مانگا. |
| لحم العجل | Veal | گۆشتی گوێرەکە. |
| لحم الخنزير | Pork | گۆشتی بەراز. |
| لحم الخنزير المملح | Bacon | گۆشتی بەرازی سوێرکراو. |
| لحم الخنزير المسلوق | Ham | گۆشت بەرازی کوڵاو. |
| لحم الغزال | Venison | گۆشتی ئاسكو مەرە کێویو بزنە کێوی. |
| لحم الغنم | Mutton | گۆشتی مەڕ. |
| لحم مفروم | Mince Meat | گۆشتی جنزاو - قیمە. |
| لحم مشوي | Roasted meat | گۆشتی برژاو، - تکە - قوشباشی - پارێڤ |
| لحم معلب | Tinned meat | گۆشتی قوتو - گۆشتی معلب. |
| لحم و بصل مشوي | | بریانی. |
| لحم محمر | Fricassee | گۆشتی سوورەوە کراو. |
| لحم مقلي | Fried meat | قاورمە گۆشتی سوورەوەکراو. |
| لحم الثمرة | Pulp of fruit | کرۆکی میوە - گۆشتی میوە؛ ئەو بەشەی کە دەخورێت لە میوە. |
| لحمة عصبية - موثق عصبي | Neuroglia | بەستەری دەماری ؛ شانەیەکی بەستەری تەنکە بەشە سەرەکییەکانی شانەی دەماریی لەمێشك و مەغزی دڕکاویدا دەبەستێت بە یەکترییەوە. |
| لحمة الاذن - شحمة الأذن | Lobe of the ear | نەرمایی گوێ. |
| لحم الأرض = دودة الأرض - خرطون | Earth worm | کرمی زەوی - گل خۆرکە؛ ئەو کرمە سوورە باریکەی کە لەناو زەویدا دەژی، زەوییەکە هەڵ دەگێڕێتەوە. |
| لحمة النسيج | Weft = woof of cloth | پۆ: دەزوی چنین کە بە باری پۆیدا رایەڵ ئەکرێت. |
| لحمية الأنف - سداد - زائدة انفية | Adenoids | زیادە گۆشتی ناو لووت کە بەری هەناسە دەگرێت. |
| لحمية العين= منضمة - ملتحمة العين | Conjunctiva | ژێر پێڵوی چاو. |
| لحن - نغمة | Tune = Air = melody | ئاواز = نەوا. |
| لحن - قطعة موسيقية | Tune = Melody = Air | پارچە مۆسیقا - ئاواز. |
| لحيمة | Coruncle = Caryncula | گۆشتۆکە - زیادە گۆشت - گۆشتۆکە؛ پارچە گۆشتێکی زیادە وەك پۆپنەی کەڵەشێر. |
| لحي - فك | Jaw-bone = maxilla | شەویلگە. |
| لحية صغيرة - عثنون | Goatee | ریشێکی بچووك-کەبشتە. |
| لحية | Beard=pogonion | ردێن -ریش =رك. |
| لحية مستعارة | False beard | ریش دروزنە-ریشی لەعیە |
| لحية التيس - قومي سلسفيل | Goats beard = salsify = Oyster plant = vegetahle oyster | هەڵە کۆك - مژیوە - ریشە بزن - پاڵمە گیایەکی بەهارییە گەڵاکەی وەکوو گەڵای کەوەر وایە گوڵێکی شین دەگرێت سەڵکی هەیە دەخورێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لحيمات الألسنة | Crassilinguae | زمان گۆشتی‌یەكان: پلەیەكە لە گیاندارە خشۆكەكان زمانەكەیان گۆشتێكی كورتە وەكوو مارمێلكە. |
| لحیـــة الغـــول - لحاء الغول | Common spleen wort = common maiden hair = | قژی دێو - قەیتەران ، رووەكێكە |
| لحية الحية | | ریشە مار، جۆرە رووەكێكی گوڵدارە. |
| لحية الحمار- كزبرة البئر | | قەیتەران |
| لحية العنز | | راجع (شنداب ، شنداب - بحری). |
| لخ | (Log) | ئامارازی پێوانی خێرایی پاپۆڕ. |
| لخ - كبيت - لخب | Loach | ماسی‌یەكی دەریایی‌یە لە كۆمەڵەی (شبوط). |
| لخص | Blepha oropachynsis = Ankyloble pharon | بە یەكەوە نووسانی پێڵوەكانی چاو - پێڵوو ئەستووری - ئەستوربونی پێڵووی چاو. |
| لخفة | Ostracon | تەلاشە بەرد؛ جۆرێكی هەیە سپی‌یە لە سەری دەنووسرێت. |
| لخم - قرش - كلب البحر | Shark | سەگی دەریا ، جۆرە ماسی‌یەكی دڕندەیە. |
| لخلخلة | To shake (athing) loose | لەقاندنی شتێك بۆ دەركێشانی. |
| لخن | Megma | (مێگما)مادەیەكە كلاوەی كێر دەری دەدات. |
| لخن | Sclerotinia = Blight = rot = mould | كەڕوویەكە لە داری بەردار دەدات و زیانی پێ دەبەخشێت. |
| لخنيس | Lychnis = lamp flower = campion | گیایەكە لە كۆمەڵەی مێخەك گوڵەكەی گەورەیە بە رەنگی سوور یان سپی. |
| لخنيس الذباب - شرك الذباب | Catch fly | مێش گرە؛ تەڵەی مێـش، رووەكێكـە مادەیـەكی لینـج دەردەدات مێرووی پێوە دەنووسێت.. |
| لدانة - لدونة | Softness = pliability = malleability = plasticity malacian | نەرمی=سیفەتێكە لە هەندێك مادەدا وای لێ دەكات كە بە ئاسانی لە قاڵبدا دابڕێژرێت، هەروەها توانای بادان و نوشتانەوەی دەبێت. |
| لدانة الظفر | Onychomalacia | نەرم بوونی نینۆك. |
| لدائن - پلاستيك - لدن - لدائني | Plastics | (پلاستیك): هەر مادەیەك كە بشێت بۆ داڕشتن، گەلێك جۆری هەیە وەكوو نایلۆن ، پلاستیك لە كارلێكی نێوان بەرهەمە ناوەنجی‌یەكانی خەڵوز پەیدا دەبێت، پلاستیكەكان دەكرێن بە دوو كۆمەڵەی سەرەكی‌یەوە.<br>(١) ئەو پلاستیكانەی كە بە گەرم كردن نەرم دەبنەوەو بە ساردكردن ڕەق دەبنەوە، وەكوو سیلیلۆید ونایلۆن.<br>(٢) ئەو پلاستیكانەی كە بە گەرم كردن ڕەق دەبنەوە وەكوو پلاستیكی (بكالیت).<br>پلاستیك بۆ گەلێك مەبەست بەكار دەهێنرێت وەكوو لە ئامرازی تەلەفۆن و رادیۆ و قۆپچەو شتومەكی ناو ماڵدا. |
| لدائن اكريلية | Acryllic plastics = Acrylic plastics | پلاستیكی ئەكریلی ؛ جۆرێكی ڕۆشنە لە پلاستیك ؛ وەك پلاستیكی (لیوسیت). |
| لدائن الفينيل | Vinyl plastic | پلاستیكی ڤینیلی؛ بەرهەڵستی زۆربەی مادە كیمیایە ئاسایی‌یەكان دەكات. |
| لدة = لد- ترب | Contemporaiy | هاوتەمەن - هاوساڵ. |
| لدركس | Liederkranz | (لایدەر كرانس)؛ جۆرێكە لە پەنیر. |
| لدغة - لسعة | Prick = Bite = sting | پێوەدان - گەستن - گەزتن = پێڤەدان - چزە لێ هەڵسان. |
| لدغ الحية | Snake bite | پێوەدانی مار. |

| | | |
|---|---|---|
| لدن - لين - مرن | Soft = supple = flexible = Ductile = lissome | نەرم؛ شتێك بشێت بۆ پیاکێشان‌و ڕاکێشان. |
| لدن | Anneal | گەرم کردن‌و ساردکردنەوەیەکی هێواشی مادەیەك لەژێر باری تایبەتیدا بۆ مەبەستی دەستکەوتنی سیفەتی تایبەتی وەکوو لە شووشەو فەخفووری‌و کانزادا دەکرێت. |
| لدونة | Plasticity | نەرمی - پلاستیکێتی یان نەرمی مل لەژێر گوێوە، ڕەوشتی نەرمی یان پلاستیکێتی لە مادەدا. |
| لديغ = ملدوغ | Bitten = stung | گەستراو - پێوەدراو. |
| لديت = حامض البكريك | Lyddite = picric acid | لایدایت - ترشی پیکریك؛ جۆرە تەقەمەنی‌یەکی بەهێزە. |
| لذة | Pleasure = Delight | خۆشی، چێژ. |
| لذة المشاهدة | Scopohilia | خۆشی تەماشاکردن. خۆشی وەرگرتن لە تەماشاکردنی شتێکدا. |
| لذة الألم | Algophilia | هەست کردن بە خۆشی لە کاتی ئازار چێشتندا، چێژ وەرگرتن لە ئازار. |
| لذع = حرق | Burning | چزە - چزان - سووتاندن - داخ کردن. |
| لذاع = محرق | Burning | سووتێنەر - داخکەر - توون‌و تیژ. |
| لذيذ | Delicious =savoury | خۆش - بەتام - بەچێژ. |
| لذيذ الطعم | Sapid | تام خۆشی. |
| لز - لزة - زرة | Ringed screw=screw eye | بورغوی ئەڵقەدار. |
| لز | Plaster | پلاستەر- لەزگە |
| لزان - لزان | Cysticus = Broom | دەوەنێکی دەشتەکی‌و ڕازاندنەوەیە. گەڵاکەی ئاوێتەو سێ پەلکە گوڵەکەی شۆڕو زەردە بەرەکەی لە بەری فاسۆلیا دەچێت، تۆوەکەی مادەی ژەهرینی تیایە. |
| لـزاب - عرعـر رفيـع - عرعر عال | Greek Juniper | هەڤریسکی گریکی، درەختێکە لە کۆمەڵەی هەڤریسك (عەرعەر)، گەڵاکەی لە گەڵای سەروو دەچێت، تەختەکەی بە نرخە. |
| لزاق - لزيق | Red legged-falcon | هەڵۆی لاق سوور؛ هەڵۆیەکی قاچ سووری بچووکە. |
| لزب - زقاق | Lany = alley | کۆڵانی باریك - کۆڵانی تەسك. |
| لزب = قليل | Little= small | کەم. |
| لزج | Viscous = viscid = adhesive = sticky = gummy = Glulinous | لینج - دەبوش - نووس= وەکوو کەتیرە. |
| لزقـة = لصقـة = لصوق | Plaster = cataplasm = emplastrum | پلاستەر- لەزگە، سارغی برین پێچانەوە، دەنرێت لە برین. |
| (لزقة الظهر) | Porous plaster | لەزگەی پشت. |
| لزمة | Syndrome | نیشانەکانی نەخۆشی‌یەك. |
| لزوجة - لزوجية | Viscosity = stickiness = viscidity | لینجی- لینجێتی ، بە بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لینجێتی مادە کەم دەبێتەوە. |
| لزوجة - نسبية | Relative viscosity | لینجی ڕێژەیی. |
| لزولة | Luzulu= wood rush = cuckoograss | (لازولا)، گیایەکی دەشتەکی‌یە بۆ لەوەڕ باشە. |
| لزوق - لصوق | Plaster | پلاستەر؛ دەنرێت لە برین پێوەی دەنووسێت هەتا چاك دەبێتەوە. |
| لزون | Agglutinable | دەشێت بۆ پێکەوە نووسان وەکوو بەسرێش یان کەتیرە. |
| لزيج - لزيق | Clotbur = Burweed = sheep bur = cocklebur = clingweed = clivers = cleavers | نووسەك - گیا نووسەك - نووسەنگ - ماچی جنۆکە - پەنێرشك - قەرواڵە ؛ ڕووەکێکە بەرەکەی دڕکی قولاپ داری پێوەیە دەنووسێت بە جل‌و بەرگەوە ، گەڵاکەی بۆ چارەکردنی پێوەدانی مارو مێرووی ژەهردار بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لزيج | Little bur = clover | كونجركە.جۆرە گيايەكە. |
| لزيق عملاق | Nerita | نێريتـا؛ گيـاندارێكی نەرمـە بريتیيـە لـە جۆرێكـی گـەورە لـە گوێچكەماسی واتـە لەيكـە قاقلەكـەی (قاوغەكـەی) شـەپۆلدارە واتـە بەرزیو نزمی تيايە. |
| لسان | Tongue = lingua | زمان - زبان |
| لسان - لغة | Language | زمان = قسەكردن. |
| لساني | Lingual | زمانی؛ هەر شتێك پەيوەندی بە زمانەوە (لغە) هەبێت. |
| لساني | Gloss- | پێشگرێكە بە مانای زمان. |
| لسان مفلوق | Cleft tongue | زمانی داتلیشاو. |
| لسان الخشب - تعشيق الخشب | Tongue of Joint | زمانەی دار؛ ددانی تەختە. |
| لسان ونقر - ذكر و انثى | Tenon and mortise | نێرو مێی تەختە. |
| لسان الأرض - الأرض الراسية | Cope = head land | زمانەی زەوی؛ زمانەيەكی زەوی چوبێتە ناو ئاوەوە. |
| لسان البحر | Armlet of the sea | زمانەی دەريا؛ كە ئاوەكە دەچێتە ناو زەوييەوە. |
| لسـان : جـر - سلق الماء | Pond weed = Dells spoons | زمانی دەريا - سلقی ئاو ، گيايەكی پزيشكیيە. |
| لسن البحر | Cuttel tone | زمانی دەريا - ئێسـكی گيـانداری مەرەكـەب وەشێن؛ هاڕاوەكـەی وەكـوو سمارتە بۆ سافكردن بەكاردێت يان وەكوو خۆراكێك دەدرێت بە باڵندەی كەناری. |
| لسان النار، شعلة | Flame | بڵێسە. |
| لسان الفرس | Horse tongue | زمانە ئەسپ؛ جۆرە رووەكێكە. |
| لسان الميزان | Cock = pointer of balance = Indicator of balance | نەرە - زبانەی تەرازوو يان قەپان؛ پارچە تەلێكی كانزاييیە بە شێوەيەكی ستوونی دەخرێتە سەر باڵێكی تەرازووەكەو دەجوڵێنرێتەوە بۆ هاوسەنگ كردنی تەرازووەكە. |
| لسان المزمار - طنطلة - فلكة | Glottis = Epiglottis | زمانە چكۆڵە - زمانە بچكۆلە. |
| لســان الطــير- شـجرة الجنـة - شجرة السماء | Tree of heaven = Chinese sumach = Japanese varnish = Ailanthus Paradise tree | زمانی باڵندە = درەختی بەهەشـت - دار ئاسمـان : درەختێكـە لـە كۆمەڵەی دارەڕەش گەڵاكەی بە زستان دەوەرێت، زۆر بەرز دەبێتەوە، گەڵاكەی پەلكی زۆرە قەراغەكەی گرنج گرنجە گوڵەكەی بـە شێوەی هێشوويەكی گەورەيە، بەرەكەی باڵدارە بۆ ڕازاندنەوەی شەقامەكانو باخچەكان دەروێـنرێت، تەختەكـەی خـەڵوزی لـێ دەردەهێـنرێت، توێكڵەكەی تاڵو بەهێزكەرە. |
| لسان المفتاح | Bit of a key | زمانەی كليل. |
| لسان رملي | Spit | زمانە لمی؛ پارچە زەوييەك لە شێوەی چووبێتە ناو ئاوەوە. |
| لسان الثور = انشوزة مخزنية = بوغلصن ورد - ماوي - حمحم - ساق الحمام. | Anchusa = Bugloss = Anchusa = officinalis = borage | گـوێزروان - بنـەگۆزروان = گاوزبـان= زمانـەگا - چەورۆكـە- بنەگۆزەڵـە؛ گيايەكە گوڵێكـی شـین دەگرێـت بـۆ مەبەسـتی پزيشـكی بـۆ ئـارەق پـێ كردنەوەو هەڵامەت بەكاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لسان الحمل= اذان الجدي= زمارة الراعي= سنبل الملك= بزردمبل | Plantain = large plantain = English plantain = plantago= water plantain= Ribgrass = Rib wort= ear= star of the earth= way bread = Alisma | زمانە بەرخ= گوێ کارژۆڵە - گوێ بەرخە- رکێشە= تورکێشە =تارکۆز گیایەکە گەڵایەکی ئەستوورو زبرو مەیلەو رەشی هەیە، گوڵەکانی سەوز یان زەردن، پێکەوە کۆمەڵ دەبن بە شێوەیەکی تۆبزی لە بەری سەنەوبەر دەچێت، چۆلەکە حەز بە دەنکەکەی دەکات، لەوەرێکی باشە بۆ ئاژەڵ ، بە شێوەی نوێنەمەک دەنرێت لە برین. |
| لسان الضب شوك فرياس | Slender thistle | زمانە قۆریی: گیایەکی دەشتەکییە گوڵی بنەوشەیی دەگرێت لە سەرەرێدا دەروێت. |
| لسان لامع | Prominence | زمانەی بریسکەدار، توێکڵە کازێکە لە هەور دەچێت ، لەکەشە گازییەکەی خۆرەوە بە شێوەی هەوری گەورەی سووردەرپەرێتو لە قەراغی پەڵەی رەشی ئەوتۆدا کۆتایی دێت پێی دەوترێت پەڵەی یان ماڵەی خۆر. |
| لسان الغزال | Moonfern = Moon wort | زمانە ئاسک، جۆرێکە لە کەرەوزە کێویلە(سرخس) لە شوێنی شێداردا دەروێت. |
| لسان الثعبان - لسان الحية - لقيفة | wort | زمانە مار، گیایەکی پزیشکییە لە شوێنی شێدارو زۆنگاودا دەروێت رەگەکەی بۆ سارێژبوونی برین باشە، جۆرێکە لەسەر خەس گەڵاکەی لە زمانی مار دەچێت. |
| سان السبع | il | زمانە شێر، رووەکێکە قەراغی گەڵاکەی ددانداره وەك مشار وایە تاڵو توونە. |
| لسان الكلب = اذان الأرنب - اذن الغزال- لصيق | Italian thistle = Gipsy-folwer = Hounds tongue = Cynoglossum | مووسەنك: گیایەکە گوڵەکەی لە گوێی کەروێشك دەچێت،شینە قەدەکەی سپیی و پەلك دارە رەگو گەڵاکەی بۆ هێمن کردنەوەو قەبزی باشە بەرەکەی وردە دەنووسێت بە جلو بەرگەوە. |
| لسان العصفور- دردار= شجرة البق - مران - بشم أسود - مران زهري | Manna ash = lark spur = ash tree = fraxinus = elm = sparrow-tongue | زمانە چۆلەکە - دارەرەش - رەشەدار- دارتۆفانە - دارمێشوولە -بناف- بناو- ووزم نارەوەند. |
| لسان الوعل - سردس مخرني | Harts tongue fern | زمانی بزنە کێوی، جۆرێکە لە کەرەوز بۆ مەبەستی پزیشکی بۆ کرمی تاك فرێدان بەکاردێت. |
| لساع | Stinging | گەزندە. |
| ل "ئێس" د، ل.س.د | LSD= LSD- 25 | ئێل، ئێس، دی مادەیەکی بێ هۆش کەرە. |
| لسبية - سحاق | Lesbianism | جووت گرتنی ژن لەگەڵ ژنێکی تردا ، پانپانۆکێ. |
| لسع - لدغ | Stinging | پێوەدان- گەستن - گەزتن. |
| لسونة - مهاة | Oryx | ئۆریکس: جۆرێکە لە مانگا کێوی. |
| لسين | Actinella | گیایەکی پزیشکی بۆنداروتاڵە، گوڵەکەی زەردە. |
| لسين | Lingula = lingule = lingua | زمانۆکە. |
| لسن - ثرثرة = لغو | Logorrhea | چەنەبازی. |
| لسينية الزهر | Liguliflorae= compositae | گوڵ زمانییەکان: کۆمەڵەیەکە لە رووەك گوڵەکانیان لە شێوەی زماندایە وەکوو تاڵیشكو کاهوو. |
| لستري | Leicester | (لیستەر): مەرێکی ئینگلیزی دەموچاو سپییە. |
| لسيعة | | راجع (علوك، علوك، فرنسي). |
| لشلاش | | دل داخورپاو، هەناسە کەوتوو. |

| | | |
|---|---|---|
| لسيع = ملسوع | Bitten = Stung | پێوەدراو- گەستراو |
| لشك | Remora = sucker fish | ریمۆرا - ماسیە مژۆك؛ جۆرە ماسی‌یەکە ئەڵقە گۆشتێکی مژۆك وا بە سەریەوەیە. بە هۆی ئەوەوە خۆی دەنووسێنێت بە گیانداری ترەوە وەکوو ماسی و نەهەنگ و خوێنەکەیان دەمژێت. |
| لص = حرامي | Robber = Thief, Burglar | دز، شەوکوت. |
| لص البحر - قرصان | Corsair = pirate | دزی دەریا. |
| لصص - لخلخ | Toloosen | ددان گرێ، نزیك بوونەوەی ددانەکان لە یەکتری‌یەوە. |
| لصف = كبرشانك شفلح | Caper = spiny coper = snake-snare | مارگیر - شیفلەتە - کەبروك- کاباروك - مارگاز( بە فارسی) - کاباروك،جۆرە رووەکێکە. |
| لصف | Elsinoe | جۆرە کەرویەکە لە میوەجات دەدات. |
| لصف - فلورية - تفلور | Fluorescence | بریسکانەوەو درەوشانەوەیەکی رەنگاو رەنگ؛ خاسیەتی گۆڕینی تیشکی رووناکی بۆ تیشکی رووناکی ئەوتۆکە شەپۆلەکەی درێژترە. |
| لصق | To adhere = adhesion | لکاندن - پیادا لکاندن- نووساندن؛ وەکوو بە هۆی زەمق یان سرێشەوە. |
| لصوق | Adhesive | لکێنەر، ئەو مادەیەیە کە رووی دوو مادەی تر دەنووسێنێت بە یەکەوە وەکو زەمق و سرێش. |
| لصوق الأواني - معجون الثقوب - ليقة | Putty | پنج؛ مادەیەکە ئامرازی شووشەی شکاوی پێ چاك دەکرێتەوە ، یان کون و کە لەبەری تەختەی پێ پڕ دەکرێتەوە. |
| لصوق- لصيق | Plaster = cataplasm = Mountant | پلاستەر- لەزگە- جۆرێکە لە پلاستەر دەنرێت لە برین پێوەی دەنووسێت هەتا چاك دەبێتەوە. |
| لصوق الخردل - لصقة الخردل | Sinapism = mustard plaster | پلاستەری خەرتەلە- لەزگەی خەرتەلە؛ نوێنەمە کێکە لە تۆوی خەرتەلە دروست دەکرێت. |
| لصيقي - بلسكاء - حشيشة الأفعى- غاليون - لزيج | Galium-aparine = goose grass = cleavers = clivers = Cling weed | گیا ئەژدیها- گیا ئەرمە- نووسەك- تیرتیرە، گیایەکی زیان بەخشە بەرەکەی بە جل و بەرگەوە دەنووسێت. |
| لصوصية | Thieving = Robbery | دزێتی، کاری دزی کردن. |
| لط | | لۆت، ماسی‌یەکی رووباری‌یە رەنگەکەی زەردە هێڵی قاوەیی تیایە. |
| لط | Monkey pot tree = sapucaia nut tree | دارو دەوەنێکە لە کۆمەڵەی مۆرد بەرەکەی لە قوتوویەکی دیوار ئەستور دەچێت، تۆوەکەی تاڵە مەیمون حەزی لێ دەکات. |
| لطاشة الذباب | Flay whisk | مێش کوژ ، ئامرازێکە بۆ مێش کوشتن. |
| لطخ | Tostain = smear | پیس کردن- سواخ دان - پەڵاویی کردن. |
| لطخة | Smear = Blotch = stain = spot = Macule = Tarnish | پەڵە. |
| لطخة القرنية = العين البيضاء = كثافة القرنية | Walleye | چاوی سپی ، خەستی و سپێتی کۆرنیای چاو، خێلی، دەرپۆقینی چاو. |
| لطخة النظر | | رێشکەو پێشکەی چاو. |
| لطخات باير | | پەڵەکانی پایر؛ پەڵەی لیمفاوین لە کۆتایی ریخۆڵە باریکەی مرۆڤدا. |
| لطر | Lohd tree | دارو دەوەنێکە رەنگێکی زەرد لە گەڵا وشك کراوەکانی دەردەهێنرێت بەرەکەی لە ترێ دەچێت بچووك و رەنگاورەنگە، یان سوور یان شین ، گوڵەکەی زەردەو بۆن خۆشە. |

| | | |
|---|---|---|
| لطش- تآكل - تعرية | Erosion | داخوران- دلڕوتانەوە. |
| لطط = تسوس الأسنان | Saprodentia = dental caries | کلۆربوونی ددان- ددان کەوتن = بێ ددانی. |
| لطع - صفع - لطم | To strike = To slap = to hit | شەبازللە لێدان - زللە لێدان. |
| لطع | | هەڵ تێزاندن. |
| لطع | Microcheilia | لێوباریکی |
| لطف - لطافة | Kindness, Passionate | جوانی ، بەسوزەوە، بە بەزەیی. |
| لطمة | Slap | چەپۆك- شەبازللە- شەقازللە - زللە -چەپۆڵە - شەپلاخ. |
| لطيف | Gentle | جوان- ناسك- بەسۆز. |
| لظى= لهيب - شعلة | Flame = fire | بڵێسە-گڕ. |
| لعاب | Saliva = spittle | لیك - تف - بۆراك - کەوشێل. شلاوێکە لووەکانی ناو دەم دەری دەدەن بۆ هەرس کردنی نیشاستەی ناو خواردن. |
| لعاب | Slaver | لیکێك کە بە دەمدا بێتە خوارەوە. |
| لعابي | Salivary | لیکی ، هەرشتێك پەیوەندی بە لیکەوە هەبێت. |
| لعابين | Ptyalin | (پتیالین)، ئەو ئەنزیمەی کە لە لیکدا هەیە، یارمەتی هەرسی نیشاستە دەدات لەناو دەمدا. |
| لعاب الشمس | Cob web = spider web | تەناف شەیتان= لیکی شەیتان: داوێکی هەڵواسراوە بە دارو دیواردا وەك داوی جاڵجاڵۆکە وایە. |
| لعاب النحل - عسل | Honey | هەنگوین، بەری هەنگ. |
| لعابة - لعبة | Toy, Doll | بووکە شووشە. |
| لعاعة | Endive | کاسنی: ڕووەکێکی دەشتەکی‌یە، گەڵاکەی شین‌و کەمێك تاڵە دەکرێت بە چێشت‌و بە بەهارات. |
| لعب - لعبة | Play = sport | لەیز- یاری - گەمە - وازی - گاڵتە - حەنەك = وەرزش. |
| لعب - فرح | Joke = Jest | گاڵتەو گەپ، نوکتە، قسەی نەستەق. |
| لعب بالسيف | Fencing | شەڕەشیر = شیربازیی - شەڕکردن بە شمشێر. |
| لعب القمار | Gambling | یاری قومار. |
| لعب رياضي | Sport | یاری وەرزش. |
| لعب سحري - ألعاب سحرية | Sleight of hand = Jugglery | سیحر بازیی. |
| لعب ناري - ألعاب نارية | Fire works | فیشەکە شێتە. |
| لعب على الحبال، جمناستك | Gymnastics | تەناف بازیی- (جوملاستیك)جومناستیك. |
| لعبة الداما | Chekers | یاری دامە. |
| لعبة = لعبة ورق | Game at cards | یاری کاغەز. |
| لعبة الهوكي | Hockey | هۆکی = شەقان - چەوگانێن: یاری گۆچان‌و تۆپی تەختە. |
| لعبة كرة الطائرة | Volley ball | یاری بالە = ڤۆلی بۆڵ. |
| لعبة كرة القدم | Foot ball | فووت بۆڵ- تۆپ تۆپێن = فتبۆلێن - یاری شەق. |
| لعبة كرة السلة | Basket ball | باسکت بۆڵ - یاری باسکە. |

| | | |
|---|---|---|
| لعبة الطاولة = لعبة النرد - لعبة الزهر | Back gammon = Trick track = Tables | یاری تاولّی= یاری تاولّە- نەردێن. |
| لعبة الدومينة = الرومينو | Dominoes | یاری دۆمینە. |
| لعبة الرمح | | رم بازیی |
| لعبة الجلف | Golf | یاری گۆڵف. |
| لعبة الكعاب - لعبة العاشق | Knuckle bones | میچێن؛ یاری کردن بە میچی ئێسقان |
| لعثـــم - ثقـــل - اللسان - لعثمة | Flatering = stammering = Bradyarthria = Brady glossia | زمان گیری- لاڵی - لاڵە پەتەیی - زمان قورسی. |
| لمط - وشم | Tattoo | خاڵو میل کوتراوی لە دەمو چاودا. |
| لعق | Licking = Lapping | لستنەوە- لێسانەوە- ئالاستن. |
| لعق البظر | Cunnilingus | قیتکە لستنەوە. |
| لعل = بلخش = ياقوت لحمر = عقيق - حجر سيلان. | Ruby = spinel ruby = Garnet = balas | لەعل - لالە- یاقووتی سوور؛ بەردێکی بە نرخە بریتی‌یە لە مادەی سلیکەیتی چەند کانزایەك وەکوو ئەلەمنیۆم و ئاسنو کالسیۆمو مەگنیسیۆم. |
| لعل- قرمز | Carmine | قرمز؛ رەنگێکی (بۆیەیەکی) سوورە. |
| لعلع - لعوس = ذئب | Wolf | گورگ. |
| لعلع - سراب | Mirage | سەراو = سەراب. |
| لعلاع | Coward | ترسنۆك. |
| لعلي - لعلة | | جۆرە گیایەکی تاڵو بەهێزکەرە بۆ تا باشە. |
| لعوض - ابن اوي | Jackal | چەقەڵ - تورك. |
| لعوة - الكلبة الحائل | She dog | دێڵەسەگ - دەڵە بەبا = مێ‌یەی سەگ. |
| لعوة = هالة الثدي | Black ring around the nipple | خەرمانەی مەمك؛ پەڵەیەکی مەیلەو رەشە بە دەوری گۆی مەمکەوە. |
| لعوق | Lambative | لێسراوە= هەرشتێك بلێسرێتەوە، وەکو دەرمان یان خواردەمەنی. |
| لعوق - دواء يلعق | Electuary = confection | دەرمانی لستنەوە؛ هەر دەرمانێك بە لستنەوە بەکاربێت. |
| لغاز - وقاع | Back biter | بوختان کەر = فیتنەباز = لە پاش ملە باس کردن. |
| لغام = زبد | Foam = froth | کەف |
| لغة = لسان | Language = tongue | زمان = زبان ؛ زمان واتە قسەکردن. |
| لغد = لغدود | Soft palate | غەبغەبە- غەرغەمە = بەرکور |
| لغد الأنسان | Second chin = Baccula | غەبغەبە |
| لغد الحيوان - غبب | Dewlap | غەبغەبەی گیاندار. |
| لغد الطيور - غبغب | Wattle | غەبغەبەی باڵندە وەکوو کەڵەشێر. |
| لغز - احجية | Puzzle = Logoriph | مەتەڵ- لۆتەر - تەلیسم |
| لغر | Lugger | لووجەر؛ کەشتی‌یەکی چارۆکەدارە، چارۆکەکەی چوارگۆشەیە. |
| لغستوم | Lagostomus | (لاگۆستۆمەس) گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە کۆمەڵـەی (شنشیلا) لە کەروێشك دەچێت پشتی قۆقزە سەری پانە لمۆزی کوڵە. |
| لغط | Noise = clamour = verbigeration | دەنگە دەنگ - ووژە ووژ- قاوو قیژ، ژاوەژاو. |

| | | |
|---|---|---|
| لغلغ | | راجع (لقلق   لقلق اسود). |
| لغم - منسق | Blast = mine | لوغم = مین ؛ ئامرازێکی لوولەیی‌یان خڕە بە مادەی تەقەمەنی ئاخنراوە، دەخرێتە ژێر زەوی یان ژێر ئاوەوە ئەگەر تەنێك یان پریشکێکی کارەبایی بەر بکەوێت دەتەقێتەوە. |
| لغم تعويق | mine | لوغمی تەگەرە تێخەر. |
| لغم ضد الأشخاص | Anti personal mine | لوغمی دژی کەسان(اشخاص). |
| لغم ضد الدبابات | Anti-tank mine | لوغمی دژی تانك. |
| لغم كيمياوي | Chemical mine | لوغمی کیمیایی. |
| لغم صوتي | Acoustic mine | لوغمی دەنگی؛ جۆرە لوغمێکە لە دەریادا دادەنرێت کە کەشتی‌یەکەی لێ نزیك بۆوە دەنگی پەروانەکەی وەردەگرێت‌و دەتەقێت‌و زیانی پێ دەگەیەنێت. |
| لغم الضغط | Pressure mine | لوغمی پاڵەپەستۆ جۆرە لوغمێکە لە شەپۆلی ئاوی کەشتی بەردەکەوێت دەتەقێتەوە. |
| لغمجي - طبردار - لغام | Sapper | ئەو کەسەی کە لوغم دادەنێت یان دەیتەقێنێتەوە. |
| لغوي | Linguist = lexicographer | زمانەوان - شارەزای زمان |
| لغوي - مختص باللغة | Linguistic = belonging to language | زمانی؛ هەرشتێك پەیوەندی بە زمانەوە هەبێت. |
| لغو - هراء | Nonsense = foolish talk = Logorhea | قسەی هیچ‌و پووچ- چەنەبازی. |
| لغوتريش | Lago Thrix | (لاکۆثریکس) جۆرە مەیموونێکە. |
| لغيث - غليث | Maslin = meslin | تێکەڵاوی گەنم‌و جۆ یان گەنم‌و پەرش. |
| لف | Wrapping = Rolling up | پێچانەوە - تێوە پێچان - ئاڵاندن - تێوە ئاڵاندن - لوول دان - پێچاندن = هەڵ پێچاندن - شەتەك. |
| لفاح | Eggplant | باینجان - باینجانە ڕەشە. |
| لفاح - يبروح = تفاح الجن | Mandragora = Mandrake | سێوە جنۆکانە؛ گیایەکی تەمەن درێژی ژەهرینی پزیشکی‌یە لە کۆمەڵەی باینجانە، بە شێوەیەکی کێویلە دەڕوێت. ڕووەکێکە گەڵایەکی زۆری هەیە لەسەر ڕووی زەوی کۆمەڵ دەبن، دوای زستان گوڵ دەکات، بەرێکی زەردی بۆن خۆش دەگرێت لە ترێ دەچێت دەرمانی ئارام دەری لێ دەردەهێنرێت. |
| لفاع كوفية = وشاح | Muffler = Livipipe = Scarf = Necker-chief | مل پێچ - سرکەیی - جامانە - مێزەر= لەچك. |
| لفاع -طرطوفة الماطلة | Jerusalem = artichoke | سێوی بن ئەرز - سێوی بن زەوی- سێڤك. |
| لفاف - عصابة = رباط | Compress Bandaage = fascia = lemniscus | برین پێچ- پێ پێچ - مل پێچ = سارغی |
| لفاف - دوار | Revolving | خولاوە- سوڕاوە. |
| لفافة (ملفاف) | Brace | دەسکی سمۆ؛ ئەو دەسکەی کە سمۆی پێ دەخولێنرێتەوە بۆ کون کردنی تەختە. |
| لفاف الساق - قلشين | Puttee | لاق پێچ - دوولاق. |
| لفاف سداة | | دارتەپان. |
| لفافة الطفل = قماط | Swaddling cloth | قومات. جل‌و بەرگی منداڵی ساوا. |
| لفة - لفيفة | Roll | کلافە = ڕۆلە. |
| لفافة تبغ - سيكارة | Cigarette | جگەرە |
| لفافية - دبلولينة | Diplolaena | (دیپلۆلاینا) دەوەنێکە لە کۆمەڵەی سەدرو (سزاب) گوڵەکەی بۆنخۆشە. |

| | | |
|---|---|---|
| لفائفي - لفانقي | Ileum = Allantoic | بەشێکە لە ریخۆڵە باریکە: درێژترین دوا بەشی ریخۆڵە باریکە. |
| لفائفي | I leac = I leal = Ileo | ریخۆڵە باریکەیی، هەر شتێك پەیوەندی بە ریخۆڵە باریکەوە هەبێت. |
| لفت = شلغم - سلجم | Turnip rape = naphew = cole | شێلم - شەلەم - شەلغەم ؛ رووەکێکی کشتوکاڵـی‌یە رەگەکەی خڕو پانە دەخورێت ، خۆراکی تیادایە، یان دەکرێت بە چێشت. |
| لفت سويدي | Rutabagas | شێلمی سویدی |
| لفت ايطالي | Italian Kale | شێلمی ئیتالی؛ جۆرێکە لە شێلم سەلکی نی‌یە. |
| لفت بري | Rampion Companula | شێلمە کێویلە ؛ گیایەکی کشتوکاڵـی سەلکدارە، سەلك و گەڵاکەی بە شێوەی زەڵاتە دەخورێت. |
| لفت هندي | Indian turnip | شێلمی هیندی ؛ رووەکێکی ئەمریکی‌یە لە کۆمەڵەی زەمەق. |
| لفتي | Napiform | شێلمی؛ ئەو رەگە خڕە گۆشتنانەی کە لە شێلم دەچن. |
| لفة - لفيفة | Roll | کلافە - بابۆڵە - گلۆڵە - پێچ - رۆڵە. |
| لفة - دورة | Turning | پێچ - سوڕانەوە. |
| لفة = حزمة | Packet | چەپك |
| لفة = نسيج - طول قماش | | تۆپ - تۆپە قماش. |
| لفتة - التفاتة | Turning of the face | ئاوڕدانەوە. |
| لفتة - نظرة جانبية | Side glance | بەلایەکی چاو سەیرکردن. |
| لفح = لفحة | Sun Scald | شەرا = گڕە - هاڵاو- ئاگرۆك - هەوای گەرم: بایەکی گەرمە دەدات لە رووەك ووشکی دەکات. |
| لفحة الشمس (في الوجه) | Sun burn | گەرما بردن. |
| لفحة - شري - بيروكولاريا - ئوريزا | Blight = Blast | شەرا ؛ نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە دەبێتە هۆی مردنی گەڵاو گوڵی قەدی رووەك بە هۆی کەڕووەوە دەبێت، وەکوو لە رووەکی تەماتەو پەتاتەدا لە پێشدا پەڵەی رەش لەسەر گەڵاو بەرەکەی پەیدا دەبێت |
| لفحة الليمونيات | Blast | شەرای درەختە لیمۆیی‌یەکان. |
| لفحة الصبار | Crown - rot | شەرای سوبێر. |
| لفحة التبغ | Black shank | شەرای تووتن. |
| لفحة الشمس | Sun scald = sun burn | شەرای خۆر - گڕەی خۆر: دەمردێکە دەدات لە توێکڵی درەخت بە هۆی گەرمی تیشکی خۆرەوە، بەوە چارەسەر دەکرێت کە توێکڵی قەدی درەختەکە بە گەچ سواغ بدرێت. |
| لفش = نفاش | Distichodus | ماسی‌یەکی رووباری سەوزی مەیلەو زیوی‌یە. |
| لفظ - نطق | Pronunciation | ووتن - گۆتن. |
| لفظي | Pronunciatory = verbal | بەزاری = بە دەمی = دەمەکی - زارەکی. |
| لفظة - كلمة | Word | ووشە |
| لفف | | بگەڕێرەوە بۆ (لفمه) |
| لفلاف | | راجع (لبلاب). |
| لفلافه = عليق | | تووترك - تووە کێویلە. |
| لفوت | Lophotes | (لۆفۆتس) ماسی‌یەکی دەریایی‌یە دەخورێت ، پەرەکەی پشتی لە تەوقی سەریەوە هەتا کۆتایی کلکی درێژ دەبێتەوە وە لە تەوقی سەردا بە شاخێك (قۆچێك) کۆتایی دێت، رەنگەکەی سەوزی مەیلەو خۆڵەمێشیيە. |

| | | |
|---|---|---|
| لفيفة - شلة = كبة خيوط | Hank | كلافەی دەزوو. |
| لفيفة اسلاك | Winding | کلافەتەل؛ وەکوو ئەوەی کە لە ئارمێچەری دەرگا کارەباییەکاندا هەیە. |
| لفيفة السيكاير | Cigarette | سیغار - قامیشە جگەرە. |
| لفيولوز | Levulose | لیڤیولۆز؛ جۆرێکە لە شەکر لە کۆمەڵەی گلوکۆز لە میوەجاتدا هەیە (شەکری میوە). |
| لفيز | Levis | (لیڤیز) ؛ پانتۆڵێکی شینی تەسکە قوپچەی مسی پێوەیە بۆ قایم کردن. |
| لفيظ | Emitted = Ejected | فڕێ دراو. |
| لقاح = مني | Sperm = semen | سپێرم - تۆوی نێر. |
| لقاح - حبوب اللقاح | Pollen | هەڵاڵە - هەڵاڵەی گوڵ. |
| لقاح (في الطب) | Vaccine = vaccin = Inoculation = vaccinum = Inoculum | پێکوت - دەرمانی کوتان - ڤاکسین، ئەو دەرمانەی کە بە دەرزی دەکرێتە لەشەوە دژی نەخۆشی وەك دەرمانی ئاوڵە (هەر دەرمانێك بکرێتە لەشەوە بۆ بەرگری کردن لە نەخۆشی). |
| لقاح الجمرة | Anthrax vaccine | پێکوتی ئاگرە (هەوڵە ، زلزلە) کە لە ئاژەڵدا بڵاو دەبێتەوە. |
| لقاح الكوليرا | Cholera Vaccine | پێکوتی کۆلیرا |
| لقاح الدفتيريا | Diphtheria vaccine | پێکوتی وەناق |
| لقاح الكزاز | Tetanus vaccine | پێکوتی دەردە کۆیان. |
| لقاح السعال الديكي | Petussis vaccine | پێکوتی کۆکەڕەشە |
| لقاح الحصبة | Measles vaccine | پێکوتی سورێژە. |
| لقاح داء الكلب | Rabies vaccine | پێکوتی هاریی. |
| لقاح الجدري | Small pox vaccine | پێکوتی ئاوڵە. |
| لقاح التيفوئيد | Typhoid vaccine | پێکوتی گرانەتا. |
| لقاح الحمى الصفراء | Yellow fever vaccine | پێکوتی زەردەتا |
| لقاح السل | Tubercline = B.C.G | پێکوتی سیل- تیوبەرکلین - بی . سی . جی. |
| لقاح ثلاثي | Triple vaccine = DPT | پێکوتی سیانی ، دژی وەناق و کۆکەڕەشەو دەردە کۆیان. |
| لقاح رباعي | Tetra vaccine Quadriple vaccine | پێکوتی چواری. |
| لقاح ت . ا . ب | T.A.B | پێکوتی (تی.ئەی.بی). |
| لقاح متعدد | Polyvalent vaccine | پێکوتی چەندینەیی. |
| لقاطة = لقطة | What is picked up | شتوومەکی دۆزراوە. |
| لقاطة الحصاد | Gleanings | پاشماوە - شارو - پاشەڕۆك = خەرمانە بەرەکەت = پاشماوەی دەغڵ و دان دوای دروێنە خەڵکی کۆیان دەکەنەوەو بۆخۆیانی دەبەن. |
| لقاعة | Ox warble fly = cattle grubs | جۆرە مێشێکی سەوزە گاز دەگرێت، لەسەر پێستی مانگا دەژی. |
| لقام - نهم شره | Glutton | تێرنەخۆر - چاوچنۆك - خۆرا - گیاندارێکی شیردەری زۆر خۆرە لە رێوی دەچێت. |
| لقانق - مقانق - سجق = نقانق | Sausage = hot dogs | سجوق - سۆسێج، جۆرێکە لە خواردەمەنی. |
| لقب = اسم شان = لقب تهكمي - نبز | Surname = nick name | نازناو = ناوو نیشان = ناو ناتۆرە. |
| لقب شرف | Tittle of honour | نازناوی شانازی. |
| لقح - تأبير = تلقيح الأنثى | Fecundation | ئاوس کردن. |

| | | |
|---|---|---|
| لقط | Gathering = Collecting | چنینەوە - کۆکردنەوە. |
| لقف | To catch | گرتنەوە- قۆستنەوە. |
| لقف | Snatch | پڕ پیاکردن. |
| لقلق - ابو حديج | Stork = ciconia | لەقلەق- حاجی لەقلەق، باڵندەیەکی راوکەرو ڕەش و سپی مل و لاق درێژە. |
| لقلق حبشي - عناز | Ethiopian stork | لەقلەقی حەبەشە، جۆرێکە لە لەق لەق پشتەکەی ڕەشی ئەرخەوانییە ، ژێر سکی سپییە سەرو باڵی ڕەشە دەنووک و لاقی سوورە. |
| لقلق ابيض - بلارج - ابو حديج | White stork | لەقلەقی سپی. |
| لقلق اسود - لغلغ - عنز | Black stork | لەقلەقی ڕەش. |
| لقلق ابديم | Abdims stork | لەقلەقی ئەبدیم، جۆرێکە لە لەقلەق لە ناوچە بیابانییەکانی وڵاتی حەبەشەدا دەژی. |
| لقلق منفرج المنقار | Open- bill stork | لەقلەقی دەنووک کراوە. |
| لقلقي غرنوقي= ابرة الراعي | Geranium | جیرانیۆم، دەرزیلۆکە، گیایەکە شێوەی بەرەکەی لەدەنووکی قازو قولنگ دەچێت. |
| لقمة | Morsel = morse | گەپێک = تیکە - پاروو. |
| لقمة العظام | Condyle = condylus | گرێ ئێسقان، چوکڵەیەکی جومگەییە لە جەمسەری ئێسکدا. |
| لقمة القاضي - زلابية | Fritter =Dumpling = dough nut = pan cake | لوقمە قازی، جۆرە شیرینییەکە. |
| لقمة القاضي = اذن الشبطان | Ottelie | گوێ شەیتان؛ گیایەکی دەشتەکییە لە قەراغی رووباردا دەژی گەڵاکەی لە ڕم دەچێت، گوڵی جوان دەگرێت. |
| لقمة الصباح - ترويقة فطور | Breakfast | بەرچایی = ناشتا - بەرقلیان - تێشت |
| لقمة العشاء - طعام المساء | Dinner = Supper | شێف - شێو - نانی ئێوارە. |
| لقمة النحجة - كباش | Spogel plantain | گیایەکی دەشتەکی پزیشکییە. |
| لقمة الحمل - لويق | Chaff Flower | گیایەکی دەشتەکییە لە کۆمەڵەی قەیفە گوڵەکەی سپییە، گەڵاکەی پزیشکییە. |
| لقمة الظهر - اكلة الظهر | Lunch | فراڤین - نانی نیوەڕۆ - قاوەڵتی - خوانی نیوەڕۆ - ژەمی نیوەڕۆ. |
| لقمة قفوية - لقمة مؤخرية | Occipital condyle | گرێی پشت مل - ئۆکسیپیتال کۆندایل؛ دوو چوکلەی ئێسکییە بە سەرەتای بڕبڕەی ملەوە نووساون. |
| لقمة - لقمة المثقاب | Bit = Boring | نووک - زمانە؛ پارچەیەکی پێچاو پێچە لە سمۆی دارتاشی. |
| لقمة دوارة | Rotary bit | چەقۆی خولاوە؛ چەقۆیەکە دەخولێتەوەو چینەکانی زەوی کون دەکات بۆ گەیشتنە نەوت، بە هۆی قوچەکێکی پۆڵاییەوە. |
| لقمة السبك - قالب | Die | قاڵب. |
| لقمة المفتاح = لسان المفتاح | Bit of a key | زمانەی کلیل. |
| لقمة الفارة (المسحاج) | Bit of a plane | زمانەی ڕەنە. |
| لقن | Luting | قوڕ. |
| لقوة= العقاب - الأنثى | She eagle | تەوار - مێی دال = کۆلارەمار= ئەیلو، جۆرە باڵندەیەکە. |
| لقوة = ضوط - شلل وجني | | ئیفلیجی شەویلگە ، نەخۆشی خواربوونی چەناگە. |
| لقيط | Foudling = Waif | زۆڵ - بووڕی (بیژی) = منداڵی فڕێ دراو - منداڵی دۆزراوە. |
| لقيط | Dracunculus | گیایەکی دەشتەکییە وەکوو سێوی بن ئەرز سەلکی هەیە. |
| لقية - لقية | A find | شتوومەکی دۆزراوە. |

| | | |
|---|---|---|
| لك = صمغ اللك | = lacquer | لۆك : جۆرە زەمقێکی ڕێسینی سوورە لە توێکڵی لق و قەدی هەندێك درەختی ناوچە گەرمەکان دەردەدرێت تەزبیحی لێ دروست دەکرێت، هەروەها بۆ ڕەنگ کردن بەکاردێت، درەختەکان وەك درەختی هەنجیری بەنگال (تين البنغال). |
| لك (لاكية) | Lacquer | لۆك، بۆیەیەکە( ڕوکەشێکە) بۆ پاراستن یان ڕازاندنەوە زوو ووشك دەبێتەوە. |
| لك | Lac = Lakh | لاك : سەد هەزار ڕوپێ. |
| لك ياباني | Japanese varnish tree = Lacquer tree | لۆکی یابانی، ژاپۆنی = مۆمی یابانی، ژاپۆنی ، جۆرە مۆمێکە لە کولاندنی تۆوی سماق یان قڵیشانەوەی توێکڵی درەختی سماق دەستگیر دەبێت. |
| لكا = ضرب | To strike = Hit | لێدان |
| لكاع = رپيز | Rhapis | ڕاپیس: درەختێکە لە کۆمەڵەی دارخورما لە ئینجانەدا دەڕوێنرێت بۆ ڕازاندنەوە. |
| لكة = بقعة = لطخة | Stain = spot | پەڵە = لەکە. |
| لكة العين = سد | Cataract | تانەی چاو : تاریك بوونی زەرەبینی چاو. |
| لكرم | Lockram | لۆکرام، قوماشێکی زبرە لە کەتان دروست دەکرێت. |
| لكروس | Lacrosse | لاکرۆس : یارییەکە بە تۆپ و ڕێکتی دەسك درێژ دەکرێت. |
| لكتوجين = لاكتوجين | Lactogen | لاکتۆجین: هۆرمۆنی شیر دەردان. |
| لكع | Horses | وولاخ = ئەسپ و ئێستر ، چارەوێ. |
| لكع | To prick | گەستنی مێش و مەگەز. |
| لكمة | Fist = A box = Buffet | چەپۆك = مستەکۆڵە = سیخورمە = بۆکس. |
| لكن | But | بەڵام = وەلێ = تەنانەت. بەڵان |
| لكن طشت | Copper (washing) basin | لەگەن = تەشتی مس |
| لكنة = لهجة | Accent = Dialect | (دایلێکت)، شێوازی زمان |
| لكنة = لثغة | Stammering = Dysarthria | زمان پیسی = زمان گیری |
| لكنين = لغنين | Lignin | (لیگنین) ڕیشاڵی تەختەی درەخت. |
| لكهورن = لجهورن | Leghorn | لێگهۆرن: جۆرێکە لە مریشك و کەڵەشێر بۆیەکەی گەورەیە ، مریشکێکە هێلکە زۆر دەکات |
| لكية | | (لۆکی) دارو دەوەنێکە گوڵەکەی بحورکە بە شێوەی هێشوو بەرەکەی ئاوکێکی سووری تیادایە بۆ ڕەنگ کردن بەکاردێت، ڕەگەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت |
| لمام = نعناع | Spearmint | نەعنا: ڕووەکێکی بۆنخۆشە. |
| لماظة = ثرثرة | Loquacity | چەنەبازی زۆر بڵەیی. |
| لما = شفنين البحر = سفن | Ray | (ڕای): ماسییەکی کرکراگەداری لەش فوت و د حوریکی هەیە سەرەکەی باریکە پێی دەوترێت (سکێت). |
| لماع = براق = صقيل | Transparent = Glossy = lustrous = shiny = Radiant = polished = Brilliant | برەوش، بریسکەدار، درەوشاوە. |
| لماعة = عقاب ذهبي | Golden eagle | داڵی زێڕین، داڵێکی گەورەیە پەڕی دەورووپشتی ملی ڕەنگ زێڕییە |
| لمام = نهم | Glutton | تێرنەخۆر: گیاندارێکی شیردەری چاوچنۆکە. |
| لمبري | | بگەڕێرەوە بۆ (لامبری). |
| لمبرج | Limburger | لیمبەرگەر: جۆرێکە لە پەنیر. |

| | | |
|---|---|---|
| لمباغو = زلخة = عناج = قطان | Lumbago | لۆمباگۆ: ئازارێکی دەمارییە لە خوارەوەی پشتدا واتە لە خالیگەدا. |
| لمبة = مصباح | Lamp | لەمپا، جۆرێکە لە چرا. |
| لمبو = سافانا برازيلية | Limpo | (لیمپۆ) سافانای بەرازیلی ، (سافانا ناوچەیەکە لە زەوی گیایەلانی بێت درەختی پەرش و بلاوی تێدا بێت). |
| لمة = شعر مستعار | Wig | کاکۆل، کلاوی قژ- قژی لەعیە. |
| لمجة = تصبيرة = لهنة | Asnack = light hasty meal | بەرکول- ژەمێك خواردنی سووکەڵە. |
| لمز = غمز | Carpat = To skit | توانج = تیرو توانج. |
| لمزين = سيارة مقفلة | Limousine | لیموزین: ئۆتۆمبیلێکی داخراو واتە قەپات. |
| لمس = مس | Touch = contact = taction | دەست لێدان: هەستیاری پێست کە یەکێکە لە پێنج هەستیارەکە بۆ هەست کردن بە سەرماو گەرماو ووشکی و تەڕیی و ڕەقی |
| لمسي = مختص باللمس | Tactile = Tactual | هەرشتێك پەیوەندی هەبێت بە دەست لێدان یان بە بەرکەوتنەوە |
| لمظة = لحسة | Lick | لستنەوە. |
| لمعان = لماع = لمع = لمعان | Shining = Flashing = Glittering = brightness = luminance | درەوشانەوە= بریسکانەوە= چریسکانەوە - پرشنگ دانەوە - درەخشانەوە = تروسکانەوە - وورشە. |
| لمعة= بريق | Lustre = Brillıancy = Glitter = Radiance | چریسکە - بریسکە - شەوق - تریفە - شەوقی مانگەشەو |
| لمعة | Spange | زەنگیانە - پوولەکە ، دەکرێت بە جلی ژنانەوە بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە |
| لمف - لنف | Lymph | لیمف - زەرداو - زینچکاو - لەمف ، شلەیەکی بێ ڕەنگە بریتی یە لە پلازمای خوێن لە بۆرییە موویینەکانی خوێنەوە دەردەدرێت بۆ شانەکانی لەش، خواردەمەنی و ئۆکسجینیان بۆ دەبات. |
| لمفي | Lymph- | پێشگرێکە بە مانای لیمف. |
| لمفاوي - لنفاوي | Lymphatic | لەمفاوی = لەنفاوی ؛ هەرشتێك پەیوەندی بە لیمفەوە هەبێت. |
| لم = جمع | To gather = To collect | کۆکردنەوە. |
| لمنة - لياء شمالي | Porbeagle = Lamna | لامنا = ماسی هێلزۆك - ماسی یەکە هێلکەکەی لەناو لەشیدا دەترووکێت واتە هێلکە کەرو بێچووشی دەبێت. |
| لمنارية | Laminaria | (لامیناریا) جۆرە ڕووەکێکە لە قەوزە دەچێت بەسەر بەردەوە دەڕوێت گەڵاکەی زەردە هەندێکی دەخورێت هەندێکی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| لمنج - لمين - لمنك - لمنجو = لاموس | Lemming = lemmus | لێمینك= لاموس ؛ گیاندارێکی شیردەری قرتێنەری بچووکی کۆچ کەرە لەمۆزی کوڵە گوێی کورتە لە دەشتی نزیك دەریاکاندا دەژی لە مشك دەچێت. |
| لمون - ليمون | Lemon | لیمو |
| لمي = لمى | Saliva = spittle | ئاوی دەم = ئاوی ناو دەم. |
| لنارية | Lanaria | (لاناریا) ؛ گیایەکی سەلك داری خشۆکە لە کۆمەڵەی نێرگزە. |
| لنجست - سرطان بحري | Spiny Lobster | قرژانگی دەریا،جۆرە گیاندارێکە. |
| لندو - عربة ركوب | Landau | (لانداو) ؛ عەرەبانەی دوو وولاخی بۆ سواربوون. |
| لنكس ، وشق | (Lynx) | ووشەك: گیاندارێکی لەیۆز یان (بەور) دەچێت بەلام بچووك تەرو کلکی کورت ترە ، لە کۆمەڵەی پشیلەیە لە دارستاندا دەژی. |
| لنسنغ | Linsang | (لینسانگ) گیاندارێکی شیردەرە لە پشیلە دەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لنكون | Lincoin | لینکۆن: جۆرێکە لە مەڕی ئینگلیزی. |
| لندي | Lindy | لیندی، جۆرێکە لە سەما. |
| لندين | Lindane | (لیندین) دەرمانێکە بۆ قەڵاچۆکردنی مێروو. |
| لنغــور - لنجــور هبار - قردمقدس | Solemnapes = sampai = Langur | لەنگوور، جۆرە مەیمونێکی پیرۆزە لای هیندیەکان ناوچەوانی کۆمەڵە تووکێکی ڕەشی پێوەیە، کلکی درێژە. |
| لهانة - كرنب - ملفوف | Cabbage | کەلەرم - کەلەمی.. |
| لهـــاة الحلـــق - طلاطلة | Uvula = cion = staphyle | زمانە بچکۆلە = زمانە چکۆلە ؛ پارچە گۆشتێکی نەرمە لە مەلا شــووەوە شۆڕبۆتەوە بۆ سەر بنکی زمان. |
| الهاتي - الهائي - لهوي | Uvular | هەرشتێك پەیوەندی بەزمانە بچکۆلەوە هەبێت. |
| لهـاث - لهـث - بهر | To loll the tongue out =To pant = To gasp = anbelation | هەناسە بڕکێ -نیخە نیخ- هەڵپە هەڵپ- زمانە جوڵێ - هەسکە هەسك، دەرهێنانی زمان لە تاو ماندوێتی و تینوێتی. |
| لهاق | White bull | گای سپی |
| لهام، جيش | Great army | لەشکری زۆر. |
| لهب - الهاب | Kindling = Inflaming | داگیراندن - داگیرساندن. |
| لهب - لهيب | Flames = Blazes | گڕ - بڵێسە - سۆڵە - تاو - کڵپە - کسپە. |
| لهب اخضر | Green flame | کڵفە. |
| لهبان - عاطش | Burning with thirst | گەرماو تینوێتی- گڕەی گەرما. |
| لهثات - لاهث | Panting = Out of breath | کەسێك زمانی دەربهێنێت لەتاو ماندوێتی و تینوێتی، هەناسە بڕکێ. |
| لهجة | Dialect = accent | زار - شێوەی زمان، دیالێکت. |
| لهجة - نحطـة - انتفاخ الرئة | Pulmonary emphysema | دەردێکی گرانە تووشی گیاندار دەبێت. |
| لهد | Overtire | بار گران کردن. |
| لهز | | ملق پێوەدانی کارژۆڵ بۆ گوانی دایکی. |
| لهد | Lick = Lapping | خواردن بە لستنەوە. |
| لهز -لكز | To Thrust = push | پاڵ پێوەنان. |
| لهزمة | | لا لغاوە - بنا گوێ - گرێی ئێسقانێکە لەژێر گوێدا. |
| لهط | To slap | لێدان بە لەپی دەست. |
| لهف - لهفة | Regret = Grief | بە پەرۆش. |
| لهفات - لاهق- ملهوق | Regretful = Grieving | بە پەرۆشی |
| لهق - مهق - حسبة. | Albinism | هۆڵی ؛ نەبوونی ڕەنگ لە پێستدا.ئەو کەسە پێستەکەی سپی و قژی سپی و چاوی سوور دەبێت. |
| لهق - احسب - امهق | Albino | هۆڵ- زۆر سپی؛ یەکێك کە پێستەکەی زۆر سپی بێت لە ئەنجامی نەبوونی ڕەنگ لە پێستەکەدا. قژی سپی دەبێت. |
| لهم | Loam | قوڕو لیتە. |
| لهم - لهوم - اكول - نهم | Glutton = belly-god | (١)زۆر خۆر= تێر نەخۆر .<br>(٢)ناوی گیاندارێکیشە. |
| لهوع | Lehua | (لێهوا) درەختێکە گوڵەکەی سوورە؛تەختەکەی ڕەقە. |

| | | |
|---|---|---|
| لهوب | Inflammable | هەرشتێك زوو گڕ بگرێت. |
| لهيب - حمراء | Red start | باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی ڕیشۆڵە بچووك و خۆش ئاوازە، ڕەنگینە هەندێکیان سەرەکەیان ڕەشە. |
| لهيبي - حجر اللهيب = بيروكسين | Peroxene | (پایرۆکسین) بەردەگڕ؛ مەعدەنێکە لە سلیکاتی کالسیۆم و مەگنیسیاو ئاسن پێکهاتووە چەند جۆرێکی هەیە. |
| لواطـــة - مضاجعـــة الذكور لوطية سدومية | Sodomy = Buggery = Homosexuality = Uranism = pederasty | بەچەبازی - هەتیوبازی - نێربازی - کۆربازی - کاری سێکسی لەنێوان نێردا. |
| لواء - أبو لووي | Wry neck = Jynx | مل گێڕە- غەزایی؛ جۆرێکە لە باڵندەی دار کون کەرە ڕەنگەکەی خۆڵەمێشی‌یە هێڵی قاوەیی تیایە بە قونە دەروات ، کلکی بەرز دەکاتەوەو ملی وەردەگێڕێت. |
| لؤلؤ - لالي | Pearl | مرواری ؛ مادەیەکی سپی بریسکەدارە بە شێوەی دەنك، بریتی‌یە لە داڕژانی مادەی سەدەف (کاربۆناتی کالسیۆم) بە شێوەیەکی نائاسایی لەناو قاوغی لەپکە (گوێچکە ماسی) دا بە دەوری ئەو تەنە بیانی‌یانەدا کە دەچنە ناو قاوغەکەوە. |
| لوازة | Loasa | گیایەکی توکنە تووکەکەی ئەگەر بەر لەشی گیاندار بکەوێت دەیسوتێنێت گوڵەکەی زەردی مەیلەو پرتەقاڵی‌یە. |
| لؤلؤي | Pearly | مرواری یان هەرشتێك پەیوەندی بە مرواری‌یەوە هەبێت. |
| لواء - علم | Flag | بەیاخ، ئاڵا. |
| لواء (رتبة عسكرية) | Major general | لیوا، پلەیەکە (مەقامێکە) لە لەشکردا. |
| لواء مدفعية | Artillery brigade | لیوای تۆپخانە. |
| عميد - قائد لواء | Brigadier general | عەمید، پلەو پایەیەکە لە سوپادا. |
| لواش البيطار- زيار | Brancles= twitch | لەواشە؛ ئامرازێکە لچی وڵاغی پێ دەبەسترێت بۆ هێمن کردنەوەی لە کاتی نال کردنیدا. |
| لواف | Felt maker | موتابچی - موتاوچی (راجع لباد). |
| لوازم - حاجيات | Necessaries = Requirements | کەل و پەل - شتوومەك - پێداویست - پێویستی. |
| لواحم - لاحمات - اكلة اللحوم | Carnivorous = fullow decr | گۆشت خۆرەکان ؛ گیاندارە گۆشت خۆرەکانی وەکوو پشیلەو سەگو وورچ و دەڵەك ..هتد. |
| لوبيـــــاء - دجر - ثامر | Kidney bean = Asparagus bean = French bean = cowpea = haricot bean = strig bean | لۆبیا - ژاژوك - ماشە سپی؛ ڕووەکێکی کشتوکاڵی‌یە ، لە کۆمەڵەی پاقلەمەنی ، دەنکەکەی لە دەنکی فاسۆلیا دەچێت، بەڵام بچووکترە دەکرێت بە چێشت. |
| لوبيا الخيل لبلاب الخيل | Horse gram | لۆبیای وڵاخ، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی پاقلەمەنی‌یەکان، بەرەکەی وەکوو ئالف دەدرێت بە وڵاخ. |
| لوبيلية | Lobelia | لۆبیلیا؛ گیایەکی دەشتەکی‌یە هەندێکی بۆ ڕازاندنەوەو هەندێکی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت بۆ چارەکردنی فەرەنگی ، گوڵی شینی مەیلەو وەنەوشەیی یان ئەرخەوانی یان سوور یان پەمەیی دەگرێت. |
| لوبيليت | Lopolith | لۆپۆلیت؛ تۆپەڵە کەڤرینی ئاگرینە. |
| لوتارية - يانصيب = بريمو | Lottery | یانسیب |
| لوت | Sciaenid = Maigre = Meagre | ماسیەکی گەورەی دەریایی‌یە درندەیە ڕەنگەکەی مەیلەو قاوەیی‌یە. |

| | | |
|---|---|---|
| لوتسيوم = لوتيتيوم | Lutecium | لۆتسیۆم؛ توخمێکی کیمیایی کانزایە لە کۆمەڵەی خۆڵە دەگمەنەکان ژمارەی ئەتۆمیەکەی (٧١) و کێشی ئەتۆمیەکەی (١٧٥) نیشانەکەی (Lu). |
| لوتيا نافعة - حشيشة الجرح حشيشة الدب | finger = Jores beard = Jupiters beard | گیایەکی دەشتەکی پزیشکییە گوڵەکەی شیلەدارو بۆنخۆش و زەردە گەڵاکەی بۆ چارەسەرکردنی برین باشە ، لە زەوی ووشکانی و لمانیدا دەڕوێت. |
| لوتين | Lntein | لوتیت |
| لوتيت | lutite | (لوتایت) کەڤرێکی قوڕینە. |
| لوتس - لوطس | Lotus =Nelumbo | سێ پەرە - شەوەر - کنێر، گیایەکی دەشتەکی و کشتوکاڵییە گەڵاکەی سێ پەلکە گوڵەکەی زەردو شیلەدارە بۆ لەوەڕ باشە. |
| لوتس النيل - عروس النيل - وردة النيل - بشنين - لوطس نيلوفر ابيض | East Indian lotus = sacred bean = Nelumbo = Nile-lily = white nenuphar | گیایەکی ئاوی سەلکدارە لە کۆمەڵەی نێلوپەر ((لیلوپەر)) گەڵاکەی گەورەو پانە سەر ئاو دەکەوێت هەروەها گوڵەکەی گەورەو پەمبەییە سەرئاو دەکەوێت بۆن خۆشە بەرەکەی لە شانەی هەنگ دەچێت خڕو نیشاستەییە دەخورێت. |
| لوتس قرني - قرن الغزال | Birds food = | تاجی باڵندە جۆرێکە لە ڕووەك. |
| لوث - ثول النحل | Swarm | پورەی هەنگ. |
| لوثة = لطخة | A stain = Blot = spot | پەڵە - پیسی |
| لوجستيكي = سوقيات | Logistic | لۆجستیکی؛ بەرژەوەندی یەکە (هونەرێکە) بۆ پێکهێنانی لەشکرێکی ئامادەکراو بە خێرای لە کاتی پێویستدا ، لە لایەنی گواستنەوەو نیشتەجێ کردن و ئازووقەوە. |
| لوج | Box(in a theatre) = Loge | لۆج ؛ ژوورێکی تایبەتی لە بینای شانۆ یان سینەمادا. |
| لوحة - جدول | Table | خشتە |
| لوح - لوحة | Plate = scapula | پلێت - لەوح - تەبەق - تابلۆ - تەبەقی تەختە یان کانزا. |
| لوح جينكو | Sheet iron | لەوحی چینکۆ. |
| لوح جينكو مموج | Corrugated iron | لەوحی چینکۆی شەپۆلدار. |
| لوح املس = لوحة بيضاء | Tabula rasa | لەوحی سپی= لەوحی ساف - ئاوزوو(ژیریی) بەر لەوەی کە هەر شتێکی لە دەرەوە بۆ بێت. |
| لوح خشب | Board = plank | لەوحی تەختە. |
| لوح ليفي | Fibre board | لەوحی فایبەر؛ لەوحێکی تەختەیە لە ڕیشاڵیی تەختەی پەستێزاو دروست دەکرێت ، سووك و قایمە لە دروست کردنی کەل و پەلی ناو ماڵدا بەکاردێت. |
| لوح فسفوري | Phosphorous plate | لەوحێکە بە ووردە فۆسفۆر سواخ دراوە لە بۆری تەلەفیزیۆندا بەکار دەهێنرێت. |
| لوح حجري = لوح اردواز = حجر | Slate | تاوێر - تەلەبەرد = تاشەبەرد. |
| لوح زجاج | Pane of glass | تەبەقە شووشە. |
| لوح معدني - صفيحة | Plate = Sheet | لەوحی مەعدەنی - تەبەقی مەعدەن. |
| لوحي - جدولي | Tabular | خشتەیی. |
| لوحي الشكل | Platysma | شێوە لەوح؛ شتێك لە شێوەی لەوحدا بێت. |
| لوح الملاط | Mortar board | تاسەی قوڕو قسڵ، بەناکان بەکاری دەهێنن. |
| لوح الكتف | Scapula = Shoulder blade = Omoplata | دەفەی شان؛ ئێسقانێکی سێ گۆشەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| لوح حساس | | لەوحی هەست کەر. |
| لوحة السيطرة - لوحة التحكم | Control board | لەوحەی دەست بەسەراگرتن: لەوحەیەکە سویچ و ئامرازی کارەبایی لەسەر دامەزرێنراوە، بۆ داگیرساندن و کوژاندنەوەی تەوژمی کارەبا. |
| لوحـــــة الأزرار - لوحة المفاتيح | Key board = switch board | لەوحەی سویچ = بۆردی کلیلەکان: بۆردی کلیلەکانی ئامرازی مۆسیقای وەکوو ئۆرگون و پیانۆ و ئامرازی نووسین (اله کاتبه) کۆمپیوتەر. |
| لوحة التوزيع | Distributing board | بۆردی کارەبا = بۆردی دابەش کردن. |
| لوحة (للرسم والكتابة) | Tablet = Drawing board | لەوحی وێنەکێشان - لەوحی نیگارکێشان. |
| لوحة الكتابة - سبورة | Black board | تەختەی رەش ؛ بۆ لەسەر نووسین لە قوتابخانەکاندا. |
| (لوح المساح) | Planchetta = surveyors board | لەوحی زەوی پێوان ، ئامرازێکە لە زەوی پێواندا بەکاردێت. |
| لوحة الوان التصوير | Palette | لەوحەی وێنەگر کە بۆیەکانی لەسەر تێکەڵ دەکەن. |
| لوحة الخملة - لوحة الخميلة | | ئەو پەردەیەیە کە وێنەی هۆی روون کردنەوەی پیا هەڵدەواسرێت لە کاتی وانە وتنەوەدا لە پۆلی قوتابخانەکاندا. |
| لوخ | Cluytia | (کلەتیا) گیایەکە گوڵی جوان دەگرێت لە نینجانەدا دەروێنرێت. |
| لوخيا = لوكيا - السائل النفاسي | Lochia | شلەی زەیستان؛ خوێن و خوێنی ئافرەتی زەیستان. |
| لودنم = صبغة الأفيون | Laudanum = tincture of opium | بۆیەی تلیاك؛ دەرمانێکە لە تلیاك ئامادە دەکرێت |
| لود لاميت | Ludlamite | (لودلامایت) ، مەعدەنێکە بریتییە لە فۆسفاتی ئاویی ئاسن و مەگنیسیوم و مەنگەنیز، رەنگەکەی سەوزی بریسکەدار بەرەو سەوزی سێوییە ئاسنی زۆر تێدایە. |
| لوذعي = ذكـي = مبدع - عبقري | Clever = genius = intelligent = wise = talented = intelligence | زۆر زیرەك - بیرتیژ = زۆرزان. |
| لوذعية = ذكاء | Cleverness | زیرەکی. |
| لور | | لۆر - لـۆرك = دەڵەمە؛ خواردەمەنیەکە لە نێوانی ژەك (مـرۆ) و پـەنیردا، بریتییە لە ئاوی پەنیر شیری تێ دەکرێت. |
| لور | Gwyniad | ماسیەکی رووباری و دەریاییە رەنگەکەی مەیلەو شینە لە قوڵاییدا دەژی گۆشتەکەی خۆشە. |
| لوراسيا | Laurasia | (لوراسیا) کیشوەرێکی (قارە) مەزن بووە، باوەڕ وایە کە یەك پارچە بووە ، بەڵام لە دواییدا لە ئەنجامی درز بـردن و رامـاڵانی پاشماوەکـەی سـێ کیشوەرە تازەکەی لێ پەیدا بووە، ئەورووپاو ئاسیاو ئەمریکای باکووریی. |
| لورنسيوم | Lawrencium | (لورەنسیۆم)، توخمێکی کیمیایی دەستکردی تیشکدەری کانزاییە کێشی ئەتۆمیەکـەی (٢٥٧) و ژمـارەی ئەتۆمیەکـەی (١٠٣ )یـە نیشـانەکەی (Lr) بەناوی زانا لۆرەنسیۆم هوە ناونراوە. |
| لوركيت | Loricate = Lorikeet | لۆرکیت؛ تووتییەکی ئوسترالیە، زمانێکی بـاریکی ریشـاڵداری هەیـە، لـە فلچە دەچێت. |
| لورو | Loro = monk | لۆرۆ؛ جۆرێکە لە تووتی. |
| لور | Lory | لوری؛ جۆرێکە لە تووتی لە ئوستراليا دەژی. |
| لوري = شاحنة | Lorry | لۆری ؛ ئۆتۆمبێلی لۆری بۆ گواستنەوەی شتومەك. |
| لوريس = لوري | Lories = Moluccan parrot | لۆریس = تووتی مۆلوکان، تووتییەکی بچووکە سەری زمانی لە فلچە دەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لورس = لوريس = ليمور هندي- قرد هندي = نسناس هندي | Loris = Lorises | (لۆریس) = مەیمونی هیندی؛ لەیمورێکی بچووکو سستە لە جوولەدا ، شەوەکییە بەسەر درەختی ناوچە ئیستیوائییەکاندا هەڵدەگەڕێت درێژییەکەی (٢٠-٢٥) سم دەبێت، قاچەکانی درێژن و چاوەکانی زۆر گەورەن ، لە باشووری هیندستانو سیلاندا دەژی ، مێروو باڵندەی بچووک دەخوات. |
| لورس | | راجع (زمج الماء) |
| لورد | Lord | لۆرت - میر ؛ پیاوێکی خاوەن زەویو زاری زۆر، پیاوێکی پایە بەرزو دەوڵەمەند. |
| اللوردية | Lordliness | لۆرتێتی = لۆردێتی؛ هەرشتێك پەیوەندی بە لۆرتەوە هەبێت. |
| لورة | | قاچ درەختێکی کێویلەی بۆن خۆشی هەمیشە سەوزە ؛ بەرەکەی لە زەیتون دەچێت بە رەنگێکی ئەرخەوانی تیر، رۆنی لێ دەردەهێنرێت و بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| لورق - قاروس | Sea Perch | ماسییەکی دەریایی ئێسکداری پەرەکە دڕکاوییە. |
| لورنس - زرق الطيور - دبق البلوط - عنم اوروبي | Mistletoe = Loranthus | دەمووکانەی بە ڕوو؛ ڕووەکێکی مشەخۆرە زیان بە درەخت دەگەیەنێت، لە دەمووکانە دەچێت. |
| لوز - منح | Almonds tree Amygdale | بادەم = باوی - بایەف - باهیڤ = باهیو - حاجی بایەف؛ درەختێکە بەرەکەی بە ووشکی دەمێنێتەوە، دەنکێکی پانی درێژ کۆڵەی تیایە، تامی خۆشە دەکرێتە چێشتو حەڵواوە.. |
| لوز فقش | Thin-shelled almonds | بادەمی توێکڵ تەنك. |
| لوز - مر - مزج | Bitter almond tree | بادەمی تاڵ - - چەقاڵە - بادەمی تاڵ - باویە تاڵ = بەرە بایەف - هەرجن؛ دەوەنێکی هەمیشە سەوزە لە درەختی مۆرد دەچێت کاکڵەکەی تاڵە هەندێك مادەی ژەهرینی تیایە وە بە تایبەتی (ئەمیکدالین) (Amygdaline) بەرەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت چونکە رۆن بادەمی بە سوودی لێ دەردەهێنرێت. |
| لـوزة الأرض - فـول سوداني - فستق العبيد | Earth almond = earth nut = nut-grass | بستەی کۆیلەکان، پاقڵەی سودانی. |
| لوز جبلي | | هەرجانە= بادامە کێویلە. |
| لوز بري | Mountain almond | بادامە کێویلە ( ) - باوی (BAWI) بایەف (BAYEF = BIF) - چەقالە - شفشك - شەواشیك = شینشین= شفشینك. |
| لوز أخضر - لوز فريك - لوز طري | Unriped almonds | فەریکە بادەم - چوالە بادەم - بایەفە تەڕە = چەقالە باوی. |
| لوز هندي اهليلج لوزي | Indian almond = country almond | بادەمی هیندی ، جۆرە بادەمێکە رۆنێك لە بەرەکەی دەردەهێنرێت پێی دەوترێت رۆنی هیندی. |
| لوز الألهة = كاكاو | Cacao tree = Theobroma | کاکاو = بادەمی هیندی، درەختێکی بەرزە تۆوەکەی وەکو قاوە دەخورێتەوە یان دەکرێتە چوکلێتەوە. |
| لوزتان - لوزة الحلق | Tonsils = almonds = paristhmion | دووبادەمە- گەاز - ئالوو - گۆشە گەلو؛ دوو لووی لیمفاوی بچووکن. دەکەونە دواوەی گەرووەوەو لەم لاو لەو لای زمانە بچکۆڵەوە بەرهەڵستی ئەو باکتریایانە دەکەن کە دەچنە ناو دەمەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| لوزي | Tonsillar | ئالوویی؛ هەرشتێك پەیوەندی بە ئالوەوە هەبێت. |
| لوزة الرضاب = غدة لعابية | Salivary gland | لووی لیك؛ لەناو دەمدایە. |
| لوزة الصدر- غدة صعترية - توتة | Thymus | لووی تایموس - لووی جاترەیی ؛ لوویەکی بچووکی کەرە (واتە بێ بۆریە) لەژێر ملدا. |
| لوز البربر- ارجان = ارقان - لوز المغرب | Argania = Argan tree = Marocco iron wood | ئەرجانیا ؛ درەختێکی درکاوییە تەختەکەی رەقە بەرەکەی لە گوێز دەچێت، رۆنی ئەرجانی لێ دەردەهێنرێت. |
| لوزية = لوزينج | Lozenge | لەوزینە= لەبزینە؛ جۆرێکە لە شیرینی. |
| لوزة | Almond | بەری بادەم. |
| لوزة | Boll | قۆزاغە = بادەمە - بەری رووەك، بە تایبەتی هی لۆکەو کەتان. |
| لوزي | Almond-shaped = Almond like | شێوە بادەمی. |
| لوزاني | Amygdaloid | بادەمی‌یانە، رەوشتێکە بۆ ئەو کەڤرە گڕکانی‌یانەی کە چەندەها بۆشایی (بڵقی) پڕ لە کانزای وەکوو ئالسایت‌و کوارتزو زیو لیتیان تیادایە. |
| لوسيت | Lucite | (لوسایت) مادەیەکی زاتنجی رۆشنە لە دروست کردنی پوازك‌و زەرەبین‌و شووشەدا بەکاردێت. |
| لوس = طبس | Loess = Loss | لۆیس ، نیشتەنی‌یەکی فشەڵە، لە مادەی لیتەو لم پێك هاتووە. |
| لوسيفرين | Luciferin | لوسیفرین؛ مادەیەکە رووناکی پەیدا دەکات وەکوو لە مێرووی گوڵە ئەستێرەدا. |
| لوص - اختلاف المنظر | Parallax = Paralax | جیاوازیی دیمەن - دیمەن جیاوازیی، گۆڕانێکی رووکەش (ظاهریة) لە شوێنی شتێکدا، بە تایبەتی تەنی ئاسمانی بینراودا، بە هۆی گۆڕان لە شوێنی بینەرەکەدا. (ناظر) |
| لوضع - قربة = زق | Water skin | کوندە = کونگە بۆ ئاو گواستنەوە.. |
| لوطي - مضاجع الذكور | Sodomite = Sodomist = homosexual = uranist = bugger | هەتیوباز - کوڕباز - بەچەباز - پوشت. |
| لوطوس - لوطس | Lotus =lotos | راجع(لوتس) |
| لوعة - حرقة | Anguish = pain | ئازار |
| لوغاريتم | Logarithm | (لۆگاریتم) ئەو توانستەیە ( ا.س) ئەگەر هاتوو بنچینەیەکی دیاری کراومان بۆ بەرز کردەوە ژمارەیەکی تایبەتی پێك دێت. بۆ نموونە لۆگاریتمی ژمارە (١٦) بۆ بنچینەی (٤) دەکاتە (٢) یان ئەگەر ژمارەی (٤) لەگەڵ خۆی لێك درا دەکاتە ٤x٤ - ١٦، لۆ(١٦) ژمارە (٤) بنچینە = ٢ لۆگاریتم. |
| لوف - ليف = فيلجوش - ليف شامي | Loofa = Luffa = Towel gourd = Rag- gourd loofah-gourd = Dish cloth = vegetable sponge = Angular sponge | (لووفا) لفکە شامی = کاری - کاردو=کاردی -کلتوری گورگ، گیایەکە لە کۆمەڵەی کوولەکە قەدەکەی خشۆکە گوڵەکەی زەردو گەورەیە بەرەکەی لە کولەکە دەچێت زۆر سەوزە چنراوێکی ریشاڵی تیادایە لە لفکە دەچێت بۆ خۆشتن بەکاردێت. |
| لوف مضلع الثمر | Acute angular sponge | لفکەشامی سوچدار |
| لوف اصفر | Xanthosoma | لووفای زەرد؛ گیایەکە لە کۆمەڵەی سێوی بن ئەرز بۆ رازاندنەوە بەکاردێت. |
| لوف مبقع - اروم - ذريـــرة = ترياق ابيض | Arum = maculatum = cuckoopoint = wake-robin | لفکە شامی پەڵەدار = لفکە شامی بەڵەك ؛ جۆرێکە لە لفکە شامی لەبەر جوانی گوڵ‌و گەڵاکەی دەروێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لوقاس | | راجع (لاميون) |
| لوقانية | Leucania | (ليوكانيا)، مێرووویەكی گەنم رەنگی زیان بەخشە لە رووەكی دەغڵو دان دەدات. |
| لوك مضغ | Masticaion = chewing = Munching | جوون، جوونی خواردەمەنی. |
| لوكو- لوكويزم - جنون الماشية | Loco = Locoism | لۆكۆ- لۆكۆیزم = شێتی مانگا- شێتی ئاژەڵ ، نەخۆشی‌یەكی دەماری‌یە تووشی ولاغو ئاژەڵ (گاو مانگا) دەبێت لە ئەنجامی خواردنی گیایەكی ژەهراوی‌یەوە(گیای شێتی). |
| لوكوديرما = بهق | Leukoderma = Vitiligo | لۆكۆدێرما - بەڵەكی ؛ نەخۆشی‌یەكی پێستە. |
| لوكاندة - مطعم | Eating house = Restaurant | چێشتخانە - لوقنتە. |
| لوكيميا - الدم الأبيض - ابيضاض الدم | LeuKemia | لوكیمیا = شێرپەنجەی سپی خوێن: نەخۆشی پتربوونی ژمارەی خڕۆكە سپی‌یەكانی خوێنو ئاوسانی سپڵ. |
| لوكس - متر - شمعة | Lux = Meter candle | لوكس = مەتر مۆم؛ پێوەرێكە بۆ تینی رووناكی دانەوە لە رووبەكی تایبەتی‌یەوە، بریتی‌یە لە یەك لوومین (Lumen) لە یەك مەتر چوارگۆشەدا. |
| لوكسون | | (لۆكسۆن) ئەو وردیلەیەی كە خێرایی‌یەكەی وەكوو خێرایی رووناكی وایە وەكوو وردیلەی فۆتۆن. |
| لولبي | Spiral | پێچاو پێچ -خارو قیچ. |
| لولب - برغي | Screw | سپرینگ= برغوو- جەر- بزماری برغوویی. |
| لولبي = زنبرك | Spring | زەمبەلەك. |
| لولبي = زنبركي | Spirochete | زەمبەلەكی ، هەرشتێك پەیوەندی بە زەمبەلەكەوە هەبێت. |
| لولبيات (داء) | SpirocheTosis | نەخۆشی زەمبەلەكی ، نەخۆشی لەو لەبی. |
| لولبيات | Treponema | ترێپۆنیما؛باكتریای سفلس(Syphilis). |
| لولينغيت | Lollingite | لۆلینگایت؛ مەعدەنێكە بریتی‌یە لە ئاسنو زەرنیق، بە شێوەی بلوور هەیە، رەنگەكەی سپی زیوویە، بەرەو خۆڵە مێشی‌یە، كەرەسەیەكی خاوی زەرنیقە. |
| لولب ارخميدس | Archimedean screw | برغووی ئەرخەمیدس ، زەمبەلەكی ئەرخەمیدس ؛ ئامرازێكە بۆ بەرزكردنەوەی ئاو بەكاردێت. |
| لولب الأذن = قوقعة الأذن | Cochlea | قاقلەی گوێچكە ؛ ئێسكێكە لە شێوەی بۆری‌یەكی پێچاو پێچدا لە ناوەوەی گوێچكەدا پەردەو شلەو كۆتایی لقەكانی دەماری بیستنی تیادایە. |
| لولو جمانة = لؤلؤة = درة | Pearl = Necklace | مرواری : بریتی‌یە لە مادەی سەدەف (كاربۆناتی كالسیۆم) ، كە بە شێوەیەكی نائاسایی دەرژێتە ناو قاقلەی لەپكە (محار) ـەوە، وەكوو بەرگری‌یەك لە گیانداری لەپكە ، دەوری ئەو تەنە بیانی‌یانە دەدات كە دەچنە قاقلەكەوە، رەنگەكەی سپی‌و بریسكەدارە ، لە دروست كردنی خشڵدان بەكاردێت. |
| لؤلؤ كبير درة | Pearl | دور = مرواری دەنك گەورە. |
| لؤلؤي | Pearly = nacreous | مرواری‌یانە: هەرشتێك پەیوەندیی بە مرواری‌یە وە هەبێت. |
| لؤلؤية= مرغريتا = اسطر الصين | Marguerite = China aster | گوڵە مرواری - گوڵە بەهارە = بەرم بڕی = گوڵە دوگمە: رووەكێكی گیایی‌یەبۆ رازاندنەوەی باخچەكان دەروێنرێت گوڵی سپی یان پەمبەیی یان بنەوشەیی دەگرێت. |
| لؤلؤية الثمر | Margyricar pus | بەرمرواری ؛ دەوەنێكی رازاندنەوەیە لە كۆمەڵەی گوڵە باخ بەرەكەی لە مراواری دەچێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لومان - سجن | = prison | بەندیخانەی بێگاری قورس، زیندان. |
| لومانجي - معتاد الأجرام | Convict = Jail bird | تاوانچی ؛ ئەو کەسەی لەسەر تاوانکردن راهاتبێت. |
| لوموتيل | Lomotil | لۆمۆتیل: دەرمانێکە بۆ چارەکردنی سك چوون. |
| لوماسية | Lomatia | (لۆماتیا) ؛ دەوەنێکی دەشتەکییە گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی زەردە. |
| لومن | Lumen | لومێن: یەکەی پێوانی لێشاوی (تینی) رووناکی دەکاتە - ٠٠١٥ و٠ی وات. |
| لوم - طفال رملي | Loam | لۆم؛ گڵێکە لە تێکەڵاوی قوڕو لیتەو لەو مادەی ئەندامی پێکهاتووە. |
| لومونيت | Laumonite | لاومۆنایت؛ مەعدەنێکە ، بریتییە لە سلیکاتی کالسیۆم و ئەلەمنیۆمی ئاویی رەنگەکەی سپی هەندێك جاریش مەیلەو سوورە. |
| لوم | Blaming | لۆمە کردن. |
| لون | Hue = colour = Tint | رەنگ-هەستێکە لەوەوە پەیدا دەبێت کە تیشکی خۆر بەر کۆرنیای چاو بکەوێت، ئەمەش لە رێگەی دەماری بینینەوە بۆ خانەکانی مێشك دەروات. |
| لون زاه | Bright colour | رەنگی بریسکەدار، رەنگی درەو شاوە. |
| لون قاتم | Dark colour | رەنگی تاریك- رەنگی تەڵخ. |
| لون غامق | Deep colour | رەنگی تێر= رەنگی تۆخ. |
| لون فاتح | Light colour = Tint = Faded cololour | رەنگی کاڵ، رەنگی چواوە. |
| لون ثابت | Fast colour | رەنگی جێگیر |
| لون ترابي | Earthy colour | خاکی، رەنگی خاکی. |
| لون كستنائي | | شێ - رەنگی کەستەنایی = رەنگی قاوەیی مەیلەو سوور. |
| لوبز- لونار | Lonar | (لونار) کەشتییەکی بۆشاییە بۆ لێکۆڵینەوە لە مانگ بەکاردێت. |
| لون توتي | Murry | رەنگی تووتی ؛ رەنگێکی رەشی مەیلەو ئەرخەوانییە. |
| لونيات - علم الألوان | Chromatic | کرۆماتیکس- رەنگ زانی - زانستی رەنگ. |
| لوني - صبغي | Chrom = chromo = chromato | رەنگی، پێشگرێکە بە مانای رەنگ. |
| لوني = صبغي = مختص بالألوان | Chromatic | رەنگی، هەر شتێك پەیوەندی بە رەنگەوە هەبێت. |
| لونيك | Lunik | لونیك؛ یەکەم رۆکێتی (موشەکی) روسییە کە بەر رووی مانگ کەوت لە ساڵی ١٩٥٩دا. |
| لونجية - مديرة المنزل | House Keeper | بەڕێوەبەری ماڵ: ئەو کەسەی کە بەکرێ دەگیرێت بۆ بەڕێوەبردنی ماڵ. |
| لونا | Luna | (لونا) ؛ کەشتییەکی بۆشاییە بۆ لێکۆڵینەوە لە هەسارەکان بەکار هێنراوە. |
| لويبة بركانية | Lapilli | چەوی گڕکانی - لابۆکەی گڕکانی؛ دەرهاوێژراوێکی گڕکانی بچووکە لە ٢و٣ سم زیاتر نەبێت. |
| لوي | Twisting = Tending = Torsion | بادان = جەڕاندن = نوشتاندنەوە. |
| لوي | Erg | ناوچەیەکی بیابانی لە کۆمەڵە لمی جووڵاوە یان گوێزراوە پێك هاتبێت. |
| لوي المعدة = وجع المعدة | Gripes | ئازاری گەدە . |
| لويحة | platelet | لەوحۆکە؛ لەوحێکی بچووك یان تەنك |
| لويحة | Planchette | لەوحۆکە؛ لەوحێکی بچووکە لەسەر دوو پێچکەو قەڵەمێکی ستوونی وەستاوە گوایا ئەگەر پەنجەی لێ بدرێت لە خۆیەوە دەست دەکات بە نووسین. |
| لويحق - بازي | Common goshawk | قەلەبەیانی = شاباز: باڵندەیەکی گۆشت خۆرە پشتی بۆزە سکی سپییە. |
| لويمس | | شاخۆچکە |

| | | |
|---|---|---|
| لويزيت | Lewisite | (لويزايت)؛ گازێكی ژەهرینە لە جەنگدا بەكاردێت. |
| لويزة - فرفحين رعي الحمام | Lemon verbena = Herblouisa = Lippia = Vervain | لویزە - لیپیا؛ گیایەكی دەشتەكیو رازاندنەوەیە لە كۆمەڵەی مینا گەڵاكەی شیرینە گوڵەكەی بچووكو سپیو بۆن خۆشە. |
| لــي | Li | (لی) ؛ پێوانەیەكی چینییە بۆ دووری (مسافه) دەكاتە سێیەكی میلێك. |
| لي - لوي- فتل | Torsion = Bending = Twisting = Tort | بادان - پێچانەوە - نووشتاندنەوە. |
| لياقة | Aptitude | لێ هاتوویی = شیاویی. |
| لياقة بدنية | Body built | رێكو پێكی لەش. |
| ليــاء - قصــف - بنبك | Lamia = Porbeagle = White shart = Mackerel- shark | (لامیا) ماســییەكی دەریــایی درندەیــە نزیكــەی (٨ مــەتر) درێــژ دەبێــت رەنگەكەی خۆڵەمێشیە ژێر سكی سپییە گۆشتەكەی دەخورێت. |
| ليان - تغوط | Defecation | گووكردن - پیسایی كردن. |
| لياس | Lias | ١- سەردەمێكی جیولۆجییە، بەشێكە لە چەرخی جوراسیك.<br>٢- پێكهاتێكی توێژاڵی قورینە. |
| لياط - ملاط | Plaster Mortar | دۆخاو - قورِ قسڵ، تێكەڵاوێك لــە گــەچو لم یــان چیمــەنتۆو لم ئــاوی تــێ دەكرێتو دەگیرێتەوە لە دروستكردنی دیواردا بەكاردێت. |
| ليباس | Lepas | |
| ليبيد - دهن - شحم | Lipid | (لیپید)= مادەی چەوری= رۆن- پی - بەز، ئەو كۆمەڵە مادەیەن كە لە ئاودا ناتوێنەوە. |
| ليبشيو | Libecclo | (لیبشیۆ)؛ جۆرێكە لە رەشەبا. |
| ليبراكسام | Libraxam | (لیبراكسام) ؛ دەرمانی كۆڵنج بە شێوەی حەب هەیە. |
| ليبرة - رطل | Libra = lb = pound | لیبرا- پاوند = پاوەن-٤٥و٣٢٧گرام یان ٤٥٢ گرام. |
| ليبية | Lippia | (لیپیا) ؛ گوڵێكە لە كۆمەڵەی مینا. |
| ليبيسيكس | Libisex | (لایبیسێكس)، دەرمانێكــە بــۆ چارەكردنی تەمــەنی نــائومێدی لــە ژنــداو پەككەوتنی ئارەزووی رەگەزیی لە پیاودا. |
| ليبتينيت | Libethenite | (لایبثینایت) مەعدەنێكە بریتییە لــە فۆســفاتی مســی ئــاوی ، رەنگەكــەی سەوزی كاڵ یان تێرە، بە شێوەی بلوور هەیە. |
| ليبيدوكروسيت | Lepidocrocite | (لیپیدۆكرۆسایت) ، مەعدەنێكــە بریتییــە لــە ئۆكســیدی ئاســنی ئــاویی رەنگەكەی سووری مەیلەو قاوەییە، یەكێكە لە كەرەسە خاوەكانی ئاسن. |
| ليبيدوليت | Lipidolite | (لیپیدۆلایت) ، مەعدەنێكە لە پۆتاسیۆمو لیتیۆمو ئەلەمنیۆمو سلیكۆنو ئۆكسجینو هایدرۆجین رەنگەكەی لەیلاقییەكی كاڵــە یان زەردی كاڵ یان خۆڵەمێشــییە ، كەرەســەیەكی خــاوی لیتیۆمــە، لــە پیشەســازی شووشــەو سیرامیكدا بەكاردێت. |
| لية - الية | | دووگ - دوینگ - دوونگ- دووگی مەڕ. |
| لية -عوجة | A twist = a bend = a curve | بایەك= پێچێك. |
| لية مشوية | | چزڵێك؛ دووگی سوورەوەكراو. |
| ليتشي - لتشية | Litchi | (لیتشی) درەختێكی ناوچە گەرمەكانە گوڵەكەی سپیو بچووكە بەرمەكەی لە هەرمێ دەچێت زەرد یان سوورە دەخورێتو مەی لــێ دروست دەكرێت كرۆكی بەرمەكەی لینجو شیرینە ، یەك دانە تۆوی تیادایە. |
| ليت | Erythaea | رووەكێكــی دەشــتەكی ر كشتوكاڵــییە لــە كۆمەڵــەی دارخورمــا لــە ناوچــە گەرمەكاندا دەروێت. |

| | | |
|---|---|---|
| لیتموس | Litmus | لیتمۆس، مادەیەکی رەنگ کەرە (رابەر)لە جۆرە قەوزەیەکی تایبەتی دەردەهێنرێت بۆ مادەی ترش و تفت و خوێ بەکاردێت. |
| لیتانافطة | Lytta Vesicatoria | مێرووێکی پزیشکییە ، رەنگەکەی زێڕییە ووشك دەکرێتەوەو دەهاڕرێت هاڕراوەکەی سوتێنەرە. |
| لیة | Loop | گرێ - ئەڵقە گرێ. |
| رمبوطان - اصفر | Rambutan = Rampostan | (رامبوتان) ، جۆرێکە لە درەختی لیتشی بەرەکەی لە شێوەی دڵدایەو زەردەو دەخورێت، مەی ئەلکهولی لێ دەردەهێنرێت. |
| لیثوب | Lithoblus | (لیتۆب) ، گیانداریکی جومگەدارە لە هەزار پێ دەچێت لەشی لە (١٥ ئەڵقە) پێکهاتووە(١٥) جووت پەلیان پێوەیە. |
| لیث - اسد | Lion | شێر |
| لیث عفریت - اسد النمل - ابو عویف - ام قس | Ant- lion = Myrmeleon | شێرە مێرووڵە؛ مێرووێکە لە پووشکە بە قنگە دەچێت باڵەکانی گەورەیە، شیلەی گوڵ دەمژێت هەروەها مێرووڵە دەخوات. |
| لیثیوم | Lithium | لیتیۆم ؛ توخمێکی کیمیایی کانزایە رەنگەکەی سپی مەیلەو زیوییە ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٣) کێشی ئەتۆمیەکەی (٦/٩) نیشانەکەی (Li). |
| لیثارج - مرتك | Litharge = Lead monoxide | (لیثارج)؛ یەکەم ئۆکسیدی قورقوشمی زەرد، بۆ رەنگ کردن بەکاردێت، هەروەها لە دروست کردنی شووشەو پڕکردنەوەی لاستیکدا. |
| لیثوغرافي | Lithography | لیثۆگرافی چاپ کردن لەسەر بەرد. |
| لیثوبون | Lithopone | (لیسۆپۆن) ؛ رەنگی سپییە کە لە تێکەڵاوی گۆگردیدی زینك و گۆگرداتی باریۆم پێك هاتووە بە شێوەی رەنگ و پڕکەرەوەی لاستیك و بۆیەو مشەما بەکاردێت. |
| لیثیة - اوکسید اللثیوم الأبیض | Lithia | (لیثیا) ؛ مادەی ئۆکسیدی لیثیۆمی سپی. |
| لیدهیلیت | Lead hillite | (لیـد هیلایت) ؛ مەعدەنێکە بریتییە لە قورقوشم و گۆگردو کاربۆن و هایدرۆجین و ئۆکسجین رەنگەکەی سپی، خۆڵەمێشی سەوزی کاڵ یان شینە. |
| لیدا | Leda | لێدا، پاشکۆی هەسارەی بەرجیسە (مشتری) یە دووری لە ئەستێرەکەیەوە ($٩٦٠٠ \times ١٠^{٣}$) میلە تیرەکەی (٥ میل) ە. |
| لیدو | Lido | لیدۆ؛ کەناری دەریا لە لم پێك هاتبێت. |
| لیرة - جنیه | A pound = sovereing | لیرە، جونەیە. |
| لیرة | Lira | لیرە، یەکەی پارە لە وولاتانی ئیتالیا ، لوبنان، سوریاو تورکیادا . هتد. |
| لیروکونیت | Liroconite | (لیرۆکۆنایت) ، مەعدەنێکە مس و ئەلەمنیۆم و زەرنیقی تیادایە رەنگەکەی شینی ئاسمانی بەرەو سەوزی ژەنگارە. |
| لیزر- لاسر | Laser | (لاسەر) - (لەیزەر)؛ زاناکان تیشکی لەیزەر بۆ گواستنەوەی ووزە بۆ ماوەی دوور بەکار دەهێنن لەسەر بنچینەی گۆڕینی هێزی کارەبا بۆچەپکی (شەپۆلی) لیزەر وە پێچەوانە کردنەوەی لە خاڵی وەرگرتندا (نقطة الاستقبال) بۆ گواستنەوەی تیشکی لەیزەر لەسەر زەوی کەوا باران و تەم دەوری خۆی دەبینێت پێویستە لە بۆڕی بەتاڵ کراودا بگوێزرێتەوە بۆ ئەوەی کە هیچ لە هێزەکەی وون نەکات. لەبەر ئەوەی شەپۆلەکانی یەکجار کورتن بە شێوەی نێرەر (مرسل) لە پەیوەندی کردندا (مواصلات) بەکار دێت بۆ ناردنی ژمارەیەکی زۆر لە نامە ، هەروەها بۆ ناردنی نیشانە واتە هێما (رموز) لە رێگەی ئەو مانگە دەست کردانەوە کە ملیۆنەها کیلۆمەتر بەرزن، لە کاتی جەنگدا بۆ ئەوەی دوژمن ئەو هێمایانەی چنگ نەکەوێت. هەروەها بۆ مەبەستی کەشتیەوانی لە دەریاو بۆشاییدا بۆ ئیش پێکردنی دەزگای لێ خوڕین ، بە کۆمپیوتەرە ئەلکترۆنییەکان بە شێوەیەکی زۆر وورد و تەواو، جگە لە بەکارهێنانی بۆ لحیم کردن و نەشتەرگەری چاو. |

| | | |
|---|---|---|
| ليزول | Lysol | (ليزۆل) : دەرمانێکی پاکژکەرەوەیە رەنگەکەی قاوەییە بریتییە لە تێکەڵاوی کریۆزۆت و قەتران و پیوو سابوون. |
| ليسانس | Licentiate | (ليسانس) بڕوانامەیەکی بەرزە دوای پلەی خوێندنی ئامادەیی بە دەرچووانی کۆلیجەکان دەدرێت پێش وەرگرتنی بڕوانامەی دوکتۆرا ، لە ریزی بەکالۆریۆس دایە. |
| ليسيثين | Lecithin | (ليسيثين) : مادەیەکی چەورە لە زەردێنەی هێلکەو شانەی لەشی گیاندارو رووەکدا هەیە. |
| ليشية | Lichia amia | ليشيا ، ماسییەکی دەریایی گەورەیە. |
| ليشيا | Lysithea | (ليشيا) : پاشکۆی هەسارەی بەرجیسە دووری لە ئەستێرەکەیەوە ( ١٨٧١٠ x ١٠$^{٣}$) میلە تیرەکەی (١٠ میل) ە . زانا (نیکۆلسۆن) لە ساڵی ١٩٣٨ دا دۆزیویەتییەوە. |
| ليشمانيا | Leishmania | (ليشمانيا)، گیاندارێکی ساکاری یەک خانەیی قامچی دارە لە خوێنی مرۆڤدا دەژی نەخۆشی [ کانی (کوانی) خورما ] بڵاو دەکاتەوە. |
| ليغنين = ليكنين | Lignine = Lignin | (ليگنين) مادەیەکی ئەرۆماتی ئاڵۆزە لەگەڵ سلیلۆز یەک دەگرێت و تەختە پەیدا دەکات. |
| ليغنايت - لجنايت | Lignite | لیگنایت: جۆرێکە لە خەڵوزی بەردین ڕەنگەکەی مەیلەو قاوەییە |
| ليغور | Ligure | (لیگیور) جۆرێکە لە بەردی بە نرخ. |
| ليف (الياف) | fiber = fibre | ریشاڵ = رووشاڵ رووش - پرووش - رێشو |
| ليفي | fibro | پێشگرێکە بە مانای ریشاڵ |
| ليفي | fibrous = Filamentous | ریشاڵی ، هەرشتێك پەیوەندی بە ریشاڵەوە هەبێ |
| ليف الزجاج | Glass fibre | ریشاڵی شووشە |
| ليف البورون | Boron fibre | ریشاڵی بۆرۆن، ریشاڵێکە لە نیشاندنی بۆرۆن بەسەر تەل کانزای تەنگستنی گەرمدا پەیدا دەکرێت ، جاری وا هەیە ئەستووری ریشاڵەکە دەگاتە ( ٠/٠٠٤)ی ئینجێك، بۆ مەبەستی زانستی و پیشەسازی بەکاردێت. |
| ليف اكريلي | Acrylic fibre | ریشاڵی ئەکریلی؛ ریشاڵێکە لە مادەی ئەکریلۆنیتریك دروست دەکرێت، لە دروست کردنی بەتانی و فەرشدا بەکاردێت. |
| ليف التال | Tal palm | ریشاڵی تال: ریشاڵی دارخورمای تال. |
| ليف الاستحمام - لوفة | Vegetable sponge = Loofah = Lufah | لفکەی خۆشتن، لفکە شامی بۆ خۆشتن. |
| ليف مغزول | Spun fibre | ڕیس. |
| ليفولوز- فركتوز | Levulose = fruit sugar fructose | لیڤیولۆز - شەکری میوە، شەکرێکی تاکە لە هەنگوین و زۆربەی میوەکاندا هەیە. |
| ليفة - ليفة معزولة من الصوف | | بەتارە - لفکە ؛ تەنراوێکە لە خوری بۆ خۆشتن بەکاردێت. |
| ليفة عصبية | Nerve Fibre | ریشاڵی دەماری. |
| ليفنة | Fibrination | ریشاڵاندن - ریشاڵاوی کردن. |
| ليفينمية - ليفينية الدم | Fibrinemia | ریشاڵاویی بوونی خوێن. |
| ليفي | Fibrous = filamentous | ریشاڵی : هەر شتێك پەیوەندی بە ریشاڵەوە هەبێت. |
| ليفين | Fibrin | (فایبرین) مادەیەکی پرۆتینییە لە خوێندا هەیە. |
| ليقة الدواة | Silk threads in an ink stand | دەزووی ئاوریشمین لە دوێتدا.(مەرەکەبداندا). |

| | | |
|---|---|---|
| ليقة - معجون | Putty | هێلم - گۆمە ليقە - هەويرێکە بۆ پڕکردنـەوەی کـون و کەلەبـەری ديـوارو دامەزراندنی تەبەقە شووشە لە پەنجەرەدا. |
| ليکانيوم - قرمزيـة - حشـرة - المغافير - الحشرة القشرية | Lecanium | قرمزی- مێرووی قرمز ؛ مێروويەکی نيو باڵيـە زيان بە درەختی بـەردار دەگەيەنێت. |
| ليکهورن | Leghorn | (لێگهورن) ؛ چاکترينی رەچەڵەکی مريشکی هێلکەکـەرە، رەنگـی سـوورو سپیو قاوەيی هەيە. |
| ليکنين | | راجع (ليغنين) |
| ليکوبوديوم - رجل الذئب | Lycopodium | لايکۆپۆديۆم= پێی گورگە ؛ رووەکێکە گوڵی ئاشکرای نی‌يە. |
| ليکنايت | | راجع (ليغنايت). |
| ليکون | Leucon | (ليوکونيد سپونج) ؛ جۆرێکە لە گيانداری ئيسفەنج، پێستەکەی ئەستوورە کەناڵی لقداری ئاڵۆزی تيادايە. |
| ليکوقراطي | Leucocratic | ليکۆکراتيک؛ رەوشتێکە بۆ کەڤرە ئاگرينە رەنگ تۆخەکان، چونکە لە ٣٠٪ کەمتر مەعدەنی تۆخيان تيادايە. |
| ليکروين | (Ligroin) = Retroleum- ether | (ليگرۆين) جۆرێکە لە مادەی ئيـثە ر لە نەوتی سرووشتی دەردەهێنرێت، ژەهرينە، زوو گڕ دەگرێت. |
| ليکير | Liqueur | جۆرێکە لە مەی. |
| ليل | Night | شەو - شەڤ - شێڤ - شێو. |
| ليل | Whimbrel | بەچکەی باڵندەی (کەرەوان). |
| ليلي | Nocturnal = nyct-nycti = Nycto- | شەوی - شەوەکی هەر شتێك پەيوەندی بە شەوەوە هەبێت. |
| ليلي نهاري | Nycto hemeral | شەوەکی رۆژەکی. |
| ليلة مقمرة | Moonlit night | مانگەشەو- هەڤی پەشەڤ- تاڤە - هەيڤ. |
| ليلبوت | Lilliput | (ليليپوت) دوورگەيەکی خەياڵی‌يە ، دانيشتووەکانی کورتە باڵان . نووسەر (سويفت) لە کتێبەکەيدا (گەشتەکانی گۆليڤەر) باسی کردووە. |
| ليلك - ليلج - ليـلاق - اغروان | Lilac= pipe tree = syringa | لەيلاق، درەختێکە نزيکەی (٦ مەتر) بەرز دەبێتەوە، گەڵاکەی هێلکەيی‌يە دەوەرێت گوڵەکـەی بـە شـێوەی هێشـووی قوچـەکی پەمبـەيی يـان شـين يـان سـپی يـان ئەرخەوانی‌يە، بۆنێکی زۆر خۆشی هەيە لە ناوچە ساردەکاندادەڕوێت. |
| ليلك فارسي- ليلج فارسي- ليلاق فارسي | Lilac | لەيلاق- دار تەزبيح ؛ درەختی ژەهرەماسی ،گوڵی ئەرخەوانی بۆنخۆش دەگرێت. |
| ليلـــك هنـــدي - ازادرخت | Indian lilac = azedarach | ئازاد درەخت يان لەيلاقی هيندیی. |
| ليلق - ليلك = بوقية | Imperial fritillary | شلێر؛ جۆرە گيايەکی تاڵە لـە کۆمەڵەی زەمەق بۆ تـاو بەمێزکردن باشـە . گوڵێکی رەنگ پرتەقاڵی شۆڕ دەگرێت. |
| ليلاقي | Lilac | ليلاك- لەيلاقی؛ رەنگێکی ئەرخەوانی کاڵ. |
| ليلوفر- نيلفه ر- بشنين - نينوفر- کرنب الماء | Nenuphar = water lilly | ليلوپەر روتاج - کاری - شلێری - ئاوی - زەمەقی ئاوی ، رووەکێکە لفە گۆمو زەنکاوەکاندا دەڕوێت رەگەکەی بە شێوەی سـەلکە، قەدەکـەی دەگاتـە سەر ئاوەکەو لەوێ گوڵو گەڵا دەکات، گوڵەکەی سەر ئاوەکە دەکەوێت. |
| ليمف | | بگەڕێرەوە بۆ لمف). |
| ليمون | Citrus = Citron | ليمۆ؛ دارو دەوەنێکە لە کۆمەڵەی مزرەمەنی لە ناوچە گەرمەکاندا دەڕوێت گوڵەکەی بۆن خۆشە بەرەکەی هەمەجۆرەيـە بـە رەنگـی سـەوز يـان زەرد، هەندێکی شيرينەو هەندێکی تفتە، دەخورێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ليمون ابو صفير - نارنج | Seville orange | نارنج: درەختێکە لە کۆمەڵەی پرتەقاڵ کرۆکی بەرەکەی زۆر ترشە دەکرێتە خواردەمەنییەوە. |
| ليمون حامض - نومي بصرة = ليمون بصرة - مسكي | Lemon = citron | لیمۆی ترش: درەختێکە لە کۆمەڵەی لیمۆ بەرەکەی لە هێلکە دەچێت ڕەنگەکەی مەیلەو پرتەقاڵییە تامەکەی ترشەو دەکرێتە چێشتو زەڵاتەوە. |
| ليمونية = ترنجان = اترجية | Citronella | گیا لیمۆ - ترنجان - ترنجۆک= گیاچایی ، گیایەکە بۆنەکەی لە بۆنی لیمۆ دەچێت، گەڵاکەی دەکرێتە چایییەوە بۆن خۆشی دەکات. |
| ليمون هندي - فراسكين = شادوك | Pomelo = Schaddock = Indian lemon | فراسکین- سندی - لیمۆی هندی؛ درەختێکە لە کۆمەڵەی لیمۆ بەرەکەی لە پرتەقاڵێک گەورەترە توێکڵەکەی ئەستوورو زەردە، ترشە دەکرێتە چێشتو زەڵاتەوە. |
| ليمون اضاليا - برغموت | Bergamot orange | بێرگامۆت ؛ جۆرێکە لە لیمۆ درەختێکی بچووکە گوڵەکەی سپی و بۆن خۆشە بەرەکەی لە هەرمێ دەچێت کەمێك تفتە، بۆنی خۆش لە توێکڵەکەی دەردەهێنرێت. |
| ليمون افندي = يوسفي افندي = يوسفي = مندرين | Mandarin orange | لاڵەنگی ؛ درەختێکی بچووکە گوڵەکەی سپییە بەرەکەی نەرمو قوپاوە توێکڵەکەی نەنووساوە بە قاشەکانەوە تامەکەی ترشو شیرینە. |
| ليمون الجنة - كريفروت = كريفون - ليمون هندي | Grape Fruit | گرێپ فروت: جۆرێکە لە لیمۆ بەرەکەی لە لیمۆی هیندی دەچێت بەڵام بەرەکەی ئاوکی زۆرترەو کەمتر ترشو تاڵە لەگەڵ شەکر دەخورێت. |
| ليمون البحر | Ximenia | دەوەنێکی بەردارە لە کۆمەڵەی زەیتون بەرەکەی لە بەری قۆخ دەچێت تفتە دەخورێت. |
| ليمون الصين | Triphasia | لیمۆی چین، درەختێکە لە کۆمەڵەی پرتەقاڵە. |
| ليمون بري | Citrus trifoliata | جۆرێکە لە درەختی لیمۆ بەرەکەی بچووکو زەردە تامەکەی تاڵە ناخورێت ، وەکوو نارنج بەکاردێت. |
| ليمون كمكات - كمكات | Citrus Japonica | (کمکوات) ؛ جۆرێکە لە لیمۆ بەرەکەی بچوکو خڕ یان لاکێشەییە کەمێك ترشە دەخورێت لە یابان دەروێت. |
| ليمون مالح - ليمون مصري - بنزهير | Egyptian small Lime lemon | لیمۆی میسری؛ بەرەکەی بچوکو نیمچە خڕە ئاوکەکەی زۆرو ترشە. |
| ليمون حلو | Sweet lemon lime | لیمۆی شیرین، درەختێکە لە کۆمەڵەی لیمۆ بەرەکەی بە قەدەر پرتەقاڵێک دەبێت. توێکڵەکەی زەردو تەنکە تامەکەی شیرینو کەمێك تاڵە. |
| ليمون كبير - بوميلو | Pummelo | پۆمیلۆ - لیمۆی گەورە |
| ليمون (نومي) بصرة - بنزهير | Lime = sour lime = Basra Lemon (Lime) | لیمۆی بەسرە = لیمۆی ترش. |
| ليمون خشن - ترنج | Citron = Pie Melon | کەبات، توێکڵەکەی دەکرێت بە مرەبا. |
| ليمون طبي | | وەسمەنگ - بەسمەنگ ح ڕووەکێکی شاخییە بۆنی گوڵەکەی لە بۆنی گوڵی لیمۆ دەچێت. |
| ليمبيت | Limpet | لیمپێت؛ جۆرێکە لە هێلکە شەیتانۆکە (قاقڵە چنۆکە) سەدەفەکەی تەنکە خۆی بە بەردو شتەوە دەنووسێنێت، گۆشتەکەی دەخورێت. |
| ليمينك | | راجع (لاموس). |
| ليمندة | Dab = Limanda | (داب) ؛ ماسییەکی دەریاییە چاوەکانی کەوتوونەتە سەر یەکتری و گۆشتەکەی دەخورێت. |
| ليمونات = سترات | Citrate | (سیترات) ؛ خوێی ترشی سیتریك. |

| | | |
|---|---|---|
| ليمونات = ليموناتة - شراب الليمون | Lemonade | ليموناته ؛ ئاوى ليمۆى شيرين كراو. |
| ليموزين | Limousine | ليمۆزين؛ ئۆتۆمبيلێكى نەفەر هەڵگرى نايابە. |
| ليموني (لون) | Lemon - Yellow | رەنگى ليمۆيى ؛ رەنگێكى زەردى مەيلەو سەوز. |
| ليموزية - بقويقة سلطانية | ،odwit | باڵندەيەكى قەراغ ئاوە لە كەرەوانە دەچێت ، دەنووكى درێژە. |
| ليمور= قرد مدغشقر - هبار - هوبر | Lemur = macaco = Chiromys | لەيموور - ليمۆر؛ گياندارێكە لـە مـەيمون دەچێـت، بچـووك‌و كلـك درێـژو فەروەدارو چاو گەورەو جوانە لە پلەى سەرەكىيەكانە (پێشەنگەكان) لەناو دارستاندا دەژى ، گياندارێكى دەگمەنە، ماڵيش دەكرێـت باڵندەو مێروو خشـــۆكەكان دەخـــوات لـــە دوورگـــەى مەدەغشـــقەرو دارســـتانە ئيستيوائىيەكانى ئەفريقياو وڵاتانى مەلايۆدا دەژى، چەند جۆرێكى هەيە، جۆرێكى تيسكنە. بە قەدەر پشيلەيەك دەبێت، دەنگێكى زل هەيە گوێ كەڕ دەكات. |
| ليمور اسود = ليمور ماكاكو | Lemur Macaco | لـەيمورى ماكـاكۆ - لـەيموورى ڕەش؛ ڕەنگەكـەى ڕەشـە لەسـەر درەخـتى دارستانەكانى خواروى كەنارى دوورگەى مەدەغشقەر دەژى. |
| ليمور طائر | Flying lemur | لەيمورى فڕندە؛ جۆرێكە لە لەيمور لە ناوەڕاستى خۆرهەڵاتى هيندستان‌و فيليپيندا دەژين شەوكىيە، هيندەى پشيلەيەك دەبێت، پەردەيـەك وا بـە لەشىيەوە بۆ فڕين بەكارى دەهێنێت. |
| ليمور حلقي الذيل | Lemur cata | لەيموورى كاتا - لـەيموورى كلـك ئەلقـەيى ، درێژىيەكـەى بـە كلكىيـەوە (١٢٠ سم) دەبێـت، لـە ناوچـە بەردەلانىيـەكانى مەدەغشـقەردا دەژى، كـە ڕادەكات كلكى بە قيتى لە هەوادا بەرز دەكاتەوە. |
| ليمونيت | Limonite = Brown haematite | (ليمونـايت) ئۆكسـيدى ئاسـنى ئـاويى كـە ئاسـنى لـى دەردەهێـنرێت ڕەنگەكەى سپى يان زەردە. |
| ليمنيا | | (ليمنيا) ؛ جۆرێكە لە شەيتانۆكەى ئاوى دەتوانێت جگە لە پێست بە سى هەناسە بدات. |
| لينوليـت - الكالسيوم | Calcium linoleate CalC18 $H_{31}$ $O_2$)2 | لينۆليتى كالسيۆم، تۆزێكى سـپىيە لـە ئـاودا ناتوێتـەوە ، لـە ئەلكـهول‌و ئيثـەردا دەتوێتـەوە ، لـەو ئاوێتانـەدا بـەكاردێت كـە دژى ئـاون‌و بـۆ جێگيركردنى بۆيەو مينا. |
| لين | Soft = Tender | نەرم - شلك. |
| لين - تلين | Malacia | نەرمى |
| لين العظام = كساح | Osteomalacia = Rickets | ئێسك نەرمى - ئێسكە نەرمە. جۆرە نەخۆشىيەكە لە ئێسكدا. |
| لينات الجد | Malaco dermata | پێست نەرمەكان؛ كۆمەڵێكە لە مێروو باڵ كالانەكەيان نەرمە وەكوو (كێچ). |
| لينات الزعانف - مفتوحات المثانة | Malaco pterygii | پەڕەكە نەرمەكان، كۆمەڵێكە لە ماسى پەڕەكەكانيان نەرمن. |
| لينات الصدف | Malaco straceae | سەدەف نەرمەكان كۆمەڵێكە لە گياندارە توێكڵدارەكان سەدەفەكانيان نەرمن. |
| لينا لؤول | Linalool | (ليناڵۆول) ؛ جۆرێكە لە ئەلكهول. |
| لينارية = حـاحب - جوز ارمانيوس | Butter and eggs = dragon bushes = Toad flax = Linaria | (ليناريا) گيايەكى دەشتەكى پزيشكىيە گوڵەكەى زەرد يان ئەرخەوانىيان شينى لەيلاقىيە گەڵاو گوڵەكەى بۆگەنە دژى مەياسيرىيە بەكاردێت. |
| ليناريت | Linarite | لينـارايت؛ مەعدەنێكـە بريتىيـە لـە گۆگرداتـى قوڕقوشـم‌و مسـى ئـاويى ڕەنگەكەى لاجيوەردى تێرە ، كەرەسەيەكى خاوى قوڕقوشم‌و مسە. |

| | | |
|---|---|---|
| لینوفر - نیلوفر - بشنین | Waterlily | لیلوپەڕ. |
| لینکوریوم | Lyncurium | (لایونکوریوم)؛ بەردێکی کارەبایی‌یە (کەهرمان) ئەگەر لە شتومەك بخشێنرێت کارەبای لەسەر پەیدا دەبێت لە دروست کردنی مۆر (ختم) دا بەکار دێت. |
| لیونة | Softness = tenderness | نەرمی، ناسکی. |
| لیوکیران | Leukeran | (لیوکیران)؛ دەرمانێکە دژی وەرەم بەکاردێت. |
| لیوکوما - كثافة قرنية العين. | Leucoma | لیوکوما : تانەی سپی سەرچاو. |
| لیوسیت | Leucite | (لیوسایت) مەعدەنی پۆتاسیۆم ئەلەمنیۆم سلیکەیت ، کەرەسەیەکی خاوە زاخی لێ دەردەهێنرێت بەردێکی بە نرخە ، بێ ڕەنگ یان سپی یان خۆڵە مێشی‌یە لە بەردە ئاگرینەکاندا هەیە. |
| لیوصطونة | Livistona | لیڤیستۆنا ؛ درەختێکە لە کۆمەڵەی دارخورما بۆ ڕازاندنەوە بەکاردێت. |
| لیوسیتیت | Leucitite | (لیوسیتایت) کەمژێکی پۆرڤیری‌یە لە مەعدەنی لیوسایت و پیرۆکسین پێك هاتووە. |
| لییفات | Fibril = Fibrilla | ریشاڵۆکەکان؛ دەزوولەی باریکن لە خانە ماسولکەدا پەیوەندیان هەیە بە کرژبوون و کشانی ماسولکەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| مائة - مئة | Hundred | سەد. |
| مائع | Liquid = Fluid | (١) گازاو ، هەڵماو.<br>(٢) شلەیەکی توند، شلەوەبوو، تیر ، لیف، شلۆك، لیقاو. |
| ماء | Aqua, Water | ئاو ، ئاڤ ، شلەیەکی بێ ڕەنگە لە دوو ئەتۆم هایدرۆجین و یەك ئەتۆم ئۆکسجین پێکهاتووە، دووەم پێویستی ژیانە دوای هەوا. |
| مائي | Aquatic, Aqueous, Hydraulic, Hydrous | ئاوی ، ئاوەکی ، ئاڤی |
| مائع، سائل متحد مع الهيدروجين ، مائي- استسقائي | Hydr, r(hydro) | پێشگرێکە بە مانای ئاو. |
| ماء أبيض = مائية بيضاء | Cataract | (کاتاراکت) ئاوی سپی چاو، بریتییە لە لێڵ بوونی زەرەبینی چاو کزبوونی هێزی بینینی چاو بە هۆی پیری و هەندێك نەخۆشییەوە. |
| ماء مثلج | Ice water | بەفراو ، سەهۆڵاو، ئاڤاتەزی. |
| مـــاء الامونيـــا = محلول الأمونيا | Aqua-ammonia = ammonium hydroxide | ئامۆنیۆم هایدرۆکساید ، گیراوەی ئەمۆنیا. |
| ماء الجنين - نخط | Foetal water = Fetal water = amniotic | ئاوی کۆرپەلە، ئاوی بەرخۆڵە، شلەیەکی لینجە دەوری بەرخۆڵە (واتە منالی ساوا) ی داوە لە منالْداندا. |
| ماء التبكر | Water of crystallization | ئاوی کریستال ، ئاوێکە لە کریستاڵی مادەکاندا هەیە ڕەنگ و شێوەیەکی ئەندازیاریان دەداتێ. |
| ماء المجاري (أو البواليع- ماء المراحيض | Sewage = sullage | ئاوی زێراب، ئاوی پیسی ماڵان کە بە زێرابدا دەڕوات. |
| ماء عسر | Hard water | ئاوی ناساز ، کە خوێی کالسیۆم و مەگنسیۆمی تواوەی تیادایە و نایەڵێت سابونی تیادا کەف بکات، بە کوڵاندن یان بە تێکردنی سۆدەی شتن چارەسەر دەکرێت. |
| ماء يسر | Soft water | ئاوی ساز، ئاوی سووك. |
| ماء قراح | Pure | ئاوی زۆر ڕوون، ئاوی ساف. |
| ماء عذب | Fresh water | ئاوی شیرین، ئاوی سازگار. |
| ماء الليثيا | Lithia water | ئاوی لیثیا ،ئاوێکی مەعدەنییە خوێیەکانی کانزای لیثیۆمی تیادا ە. |
| ماء التبريد، محلول التبريد، المادة المبردة | Coolant | ئاوی ساردکردنەوە، گیراوەی ساردکەرەوە. |
| ماء اقليمي = مياه اقليمية | Territorial waters | ئاوی هەرێمی. |
| ماء ساماغريب | Samagrip | ئاوی ساماگریپ، دەرمانێکە بۆ چارەکردنی باکردن لە منداڵدا بە شێوەی شلە هەیە. |
| ماء جافيل | Javelle water | ئاوی جافیل، گیراوەی ئاوێتەی هایپۆ کلۆرید سۆدیۆم ( بۆ پاکژکردنەوە بەکاردێت) . |
| ماء الداج | Aquadag | ئەکواداگ، گیراوەیەکی ملە لە گرافیت و ئاو بۆ چەورکردنی مەکینە بەکاردێت. |
| ماء مؤكسج | Oxygenated water | (١) ئاوێك کە تێربێت بە ئۆکسجین.<br>(٢) گیراوەی مادەی پرۆکسیدی هایدرۆجین لە ئاودا. |

| | | |
|---|---|---|
| ماء الكلس | Lime water | ئاوی قسڵ |
| ماء الورد= جلاب | Rose water =Rose-Alba | گوڵاو. ئاوی گوڵەباخی ئەصلی. |
| ماء ملكي= ماء الملك - ماء الذهب | Aquaregia = nitrohy dro chloric acid = chloro nitrous acid | ئاوی شاهانە، شائاو، نیترۆ هایدرۆکلۆریك ئەسید، بریتییە لە تێکەڵاوی نیتریك ئەسیدو هایدرۆکلۆریك، ئەسیدی پەیت، شلەیەکی پەرشەو بووە دووکەڵێکی زەردی لێ هەڵدەستێت خنکێنەرە ژەهرینە لە پیشەی مەعدەنسازیو تواندنەوەی هەندێك کانزادا بەکاردێت وەکوو کانزای (پلاتین و زێر) . |
| ماء الجير = ماء الجص | Lime water | ئاوی قسڵ ، قسڵاو کالسیوم هایدرۆکساید، دۆخاو، دۆغاو. |
| ماء معدني، ماء فوار | Seltzer = mineral water | ئاوی کانزایی، ئەو ئاوە سروشتییەی کە لە ناخی زەوییەوەدێتە دەرەوەو خوێی تەواوەی تیادایە کە تامێکی تایبەتی دەداتێ بۆ خواردنەوە بەکاردێت، هەندێك جۆری تری هەیە، کە گۆگردی تیادایە بۆ مەبەستی چارەکردنی نەخۆشی پێست بەکاردێت. |
| ماء التبلور- ماء الأماهة | Crystallization = water of hydration | ئاوی بلوری، ئەو ئاوەی کە لە باری یەکگرتندایە لە زۆربەی بلورەکاندا ، بە گەرم کردن لادەچێت ، ئەوساکە بلوورەکە ڕەوشتی بلووری خۆی وون دەکات و دەچێتە شێوەی تۆزەوە (مسحوق) وەکوو لە زاجی شیندا. |
| ماء مقطر | Distilled Water | ئاوی دڵۆپێنراو. |
| ماء فاتر | worm water | ئاوی شلەتێن. |
| ماء الرسغ | Water of pastern = carpus water | ئاوی مەچەك، نەخۆشییەکە تووشی مەچەکی وولاخ دەبێت دەقڵیشێت و کێمێکی بۆگەنی لێ دێتە دەرەوە. |
| ماء المراحيض | Sewerage | ئاوی ئاودەست و زێراب. |
| ماء الزجاج | Water glass | ئاوی شووشە گیراوەی سۆدیۆم سلیکەیت یان پۆتاسیۆم سلیکەیت لە ئاودا. |
| ماء الزبيب | Raisins Juice | خۆشاو ، خۆشاب. ئاوی مێوژ. |
| ماء الصودا - كازوز- مياه غازية. | Soda water | ئاوی سۆدە. |
| ماء اللحم، ثريد، عصيدة، شوربة اللحم | Meat soup = porridge = gruel = beef tea | گۆشتاو، ئاوی گۆشت. |
| ماء ثقيل | Heavy water | ئاوی قورس، بریتییە لە ئۆکسیدی دیوتیریۆم ($D_2O$) و ئەو ئاوەیەکە لە ئۆکسجین و هایدرۆجینی قورس پێك دێت، خەستی ڕێژەییەکەی (١و١) بە شێوەی هێمن کەرەوە لە پرۆژەکانی ووزەی ئەتۆمیدا بەکاردێت، ، بە ڕێژەی یەك بۆ پێنج هەزار لە ئاوی سروشتیدا هەیە. |
| ماء القلي | Lye | ئاوی قڵیە، گیراوەی هایدرۆکسیدی سۆدیۆم ، بۆ جل شتن و دروستکردنی سابون بەکاردێت. |
| ماء النار، ماء الفضة | Aquafortis | ئاوی ئاگر، ترشی نایتریك. |
| ماء الشعير - بيرة | Beer | ئاوی جۆ، بیرە. |
| ماء الكولونيا - كولونيا | Cologne | قۆلۆنیا، بۆنێکی خۆشە. |
| ماء أزرق - مائية زرقاء = ماء اسود | Glaucoma | گلۆکۆما، ئاوی ڕەش ، ئاوی شینی چاو، شیناوی چاو، تەمێکە لەسەر پەلەزەی چاو پەیدا دەبێت و دەبێتە هۆی کوێری. |
| ماء راكد - ماء اسن | Stagnan water | زۆنگاو، ئاوی وەستاو، گەنداو، گەراو، گۆل. |
| ماء جاري | Running water | ئاوی ڕەوان، ئاوی بەخور. |
| ماء ضحل | Shallow-water, Shoal wate | |

| | | |
|---|---|---|
| ماء المطر | Rain water | باراناو. |
| مـاء جـوفي = ميـاه جوفية- ماء ارضي | Under ground water = ground water = subtrranean water | ئاوی ژێر زەوی. |
| ماء الكلور | Chlorine water | ئاوی کلۆر ، گیراوەی کلۆر لە ئاودا، شلەیەکی مەیلـەو زەردە بـۆ پاککردنـەوەو لابردنـی بۆنـی نـاخۆش لـە تاقیگـەی کیمیـاییدا بەکاردێت. |
| ماء الرجل - ماء منوي - ماء الذكر | Sperm=semen | ئاوی پیاو، تۆم، تۆماو، شاوەت. |
| ماء الصابون - ماء الغسيل | Washing water, foam water | ئاراو، سابوناو. |
| ماء متساقط | | رێژاو. |
| ماء الرماد | Lye = alkaling solution, cinder water | خۆڵاو، ئاوی خۆڵەمێش. |
| ماء التوابل | Mulligatawny | مولیگەتۆنی، شۆربای مریشك کاری (بەهاراتی) تێکرابێت. |
| ماء عكر | Turbid-water = muddy-water | ئاوی لێڵ ، ئاڤا شێلی. |
| ماء مالح - ماء اجاج | Salt-water = brine | سوێراو، شۆراو ، ئاوی سوێر ، ئاوی شۆر. |
| مائدة | Table = eating table | خوان ، سفرە ، خوانگە ، مێزی نان خواردن. |
| مائل | Obligue | لار، لێژ. |
| مائل ، ضارب الى | -ish | مەیلەو ، وەکو مەیلەو سوور redish. |
| مائل الى الأزرق = مزرق | Bluish | مەیلەو شین ، کەژاڵ ، شین باو. |
| مائل الى الأسود - مسود | Blackish | تەحلك، رەش باو ، مەیلەو رەش، رەشکەلە. |
| مـائل الي الأحمـر - محمـر، خاص بالكريات الحمراء | Erythroid | سووریاو، خرۆکەی سووری خوێن. |
| مائل الى الأخضر - مخضر | Greenish | سەوز باو. مەیلەو سەوز. |
| مائل الى الأحمر | Erythrism | مەیلەوسوور. |
| مائل الى الأصفر- مصفر | Yellov-ish | زەرد باو ، مەیلەو زەرد. |
| مابض | Ham = hocK = inner side of Knee | بن هەنگڵ، ژێر ئەژنۆ. |
| مئبر - ميبر- مئبار | Needle-case = needle-box | دەرزی دان، قوتویەکە دەرزی تێ دەخرێت. |
| مآب - مرجع | Resort | شوێنی گەرانەوە، شوێنی سەردان. |
| مئبر | Anther | پۆرگ ، بەشێکە لە ئەندامی نێرینەی گوڵی رووەك، هەلآلەی تیا دایە. |
| مابين عقدتين | Inter node | نێوان دوو گـرێ، میـچ، وەکـوو ئێسـقانی نێـوان دوو گـرێی (جومگـەی) پەنجەی مرۆڤ. |
| مابين الكواكب | Interplanetary | نێوان هەسارەکان ، بۆشایی نێوان هەسارەکان. |
| مابين النجوم | Interstellar | نێوان ئەستێرەکان بۆشایی نێوان ئەستێرەکان، ئەوەندە فراوانەبە سالـی رووناکی دەپێورێت. |
| ما بعد البنفسجي - ما فوق البنفسجي | Ultraviolet | سەروو وەنەوشەیی، ئەو تیشکانەی کـە درێـژی شـەپۆلەکانی لـە نێوانـی (١٠٠) و (٣٩٠٠) ئەنگستروم دان. |
| ما بعد السمعيات | Ultrasonics | سەروو دەنگییەکان ، ئەو لەرینەوەی دەنگانەیە کە هاتووچۆیەکی (تردد) زۆر بەرزیان هەیە گوێی مرۆڤ درکیان پێ ناکات. |

| | | |
|---|---|---|
| مابون = ملوط = جبيس- مجبـــــوس، لوطـــــي، مضاجعة الذكور | Catamite = Passive sodomite | دوودەکی ، هەر کوڕێك یان پیاوێك( گان) بدات، کاری سێکسی لە نێوان ڕەگەزی نێردا. |
| ماتا ماتا | Matamata | ماتا ماتا، جۆرێکە لە کیسەڵ. |
| ما تحت المهاد | Hypothalamus | ژێر لانکە بەشێکە لە مێشك ئیشەکەی ڕاگرتـنی پلـەی گـەرمیو گۆڕیـنی چەوریی‌و ئیشتیهای خواردنە. |
| ماتم = تعزية | Funeral meeting | پرسەی مردوو. |
| مـاتي - متــة - بهشــية الشاي - شاي براغواي | Mate = Paraguay tea | ماتی ، چای پاراگوای، درەختێکی گەورەیە لە باشوری ئەمەریکادا دەڕوێت بەرەکەی سوورەو گەڵاکەی وەکوو چایی بەکاردێت. |
| ماثلـة - شمعـــدان، هرمي الشكل | Pyramidal Fruit tree, candleholder, candlestick | کووچەکی، شێوەیەکە لە شێوەکانی هەڵپاچینی درەختی پەرژین. |
| ماج = طارد للحراة | Exother mic | گەرمی دەرکەر، هەر کارلێکێکی کیمیای گەرمی بدات. |
| ماجوت، دب الكسلان | Slothbear | ماجوت ، ورچێکی تیسکنە لە هندستان دەژی.. |
| منجنـــة= منجـــن = مضراب الغسيل | Beat at cloth, cloth beaten | شوینك، گەڵا کوتك، کوتکی جل شتن. |
| ماجنيت - ماگنيتايت - مغنيتيت | Magnetite | مانگنیتایت، ئۆکسیدی ئاسـنی سروشـتی ڕەنگەکـەی ڕەشـە بریتی‌یـە لـە کەرەسەی خاوی ئاسن. |
| ماجدة- زهرة المجد | Glory pea = parrots bill | دەنووکی تووتی، دەوەنێکە گوڵێکی گەورەی جوان دەگرێت. |
| ماجور - مستاجر | Hired | بەکرێ گیراو. |
| ماجن - قليل الحياء | Shameless, ill mannered | بێ شەرم. |
| ماح = مح | YolK of egg | زەردێنەی هێلکە. |
| ماحوز | Manettia | ( مانێتیا)، دەوەنێکـی کـە پـڕیو دەشـتەکیو ڕازاندنەوەیـە گوڵەکـەی لـە ڕەحەتی دەچێت ڕەنگەکەی ئەرخەوانی‌یە. |
| ماحل -ممحل، قاحل | Barren =sterile | ووشکانی، قاتو قڕی، زەوی بەیار، زەوی‌یەك کە بێ پیتو بەرەکەت بێت. |
| ماخ، عدد ماض | Mach nomber | ژمارەی ماخ، ڕێژەی نێوانی خێرایی تەنێك و خێرایی دەنگ لەو کەشەدا. |
| ماخور- بيت الدعارة - مبغى | Bawdy = house = whore shop | قەحپەخانە ، کەللەچی، شوێنی بێ شەرمی، شوێنی بێ‌ئابڕوویی. |
| باخرة - سفينة | Ship | کەشتی ، پاپۆڕ. |
| ماخض (للمراة) | Parturient | ئافرەتی ژان گرتوو، واتە لەسەر منداڵ بوون بێت. |
| ماخض (للأنثى الحيوان) | About of calf | گیانداری مێی ئاووس کە لەسەر بێچوو بوون بێت. |
| مادة - هيولي | Substance = matter = Material | مادە، سفن، بابووار، بابەت، هـەر شتێك کەلێنێك لـە بۆشـایدا داگیر بکاتو کێشی هەبێت وەکوو هەوا، ئاو هتد. |
| مادة مسامية | Porous Matter | مادەی کون کون ، مادەی کونیلەدار. |
| مادة مالئة | Filler | مادەی پڕکەرەوە مادەیەکە لە دروست کردنی پلاستیك‌و بۆیەدا بەکاردێت. |
| مادة غذائية | FoodStuff | خواردەمەنی ، خۆراك، بژێو. |
| مادة مضادة للجراثيم | Germicide | جیرمیساید، دەرمانی کوشتنی میکرۆب، مادەی میکرۆب کوژ. |
| مادة مضادة للسم= مضادات السم | Anti toxin | مادەی دژە ژەهر. |

| | | |
|---|---|---|
| مادة مابين المجرات | Interglactic matter | مادەی نێوان گالاكسییەكان. |
| مادة متفجرة | Explosive | مادەی تەقەمەنی. |
| مادة قابلة للاحتراق | Combustible material | مادەی شیاوبۆ سوتان، هەرمادەیەك بشێت بۆ سوتان بەبێ گوێ دانە پلەی كڵپەكردنی. |
| مادة لامة | Collector | مادەی كۆكەرەوە،مادەی گرد كەرەوە. |
| مادة تلوين | Colorant | مادەی رەنگكەر، هەر مادەیەك رەنگ بدات بە مادەی تر، بە شێوەی رەنگ و بۆیە هەیە، وەكوو كلۆرۆفیل لە رووەكدا. |
| مادة دابغة | | گەمار، مادەی دەباغ كەر. |
| مادة تطعيم – لقاح | Vaccine | ماك، دەرمانی كوتان ، پێكوت. |
| مادة رابطة | Binding matter | مادەی بەستەر، مادەی لكێنەر. |
| مادة قارضة | Corroding, rodent | مادەی داخۆر. |
| مادة مسكنة | Depressant = sedative | مادەێ هێمنكەرەوە، مادەی دامركاندنەوەی ئێشو ئازار. |
| مادة خام – مادة اولية | Elementary or raw material | مادەی خاو، كەرەسەی خاو. |
| مادة مغذية | Nutrient | مادەی خۆراك پێدەر. |
| مادة غروية | Colloidal | مادەی مل-ملتە. |
| مادة رسوبية | Sediment | مادەی نیشتوو. |
| مادة لاصقة للأواني الفخارية | Adhesive | پنج ، ما. |
| مادة مشعة | Radioactive | مادەی تیشك دەرەوە وەكوو یورانیوم. |
| مادة متطايرة = مادة طيارة | Volatile material | مادەی هەڵچوو، مادەی سووكوڵە كە زوو دەبێت بە هەڵم. |
| مادة سنجابية | Grey matter | مادەی خۆڵەمێشی، چینی دەرەوەی مێشكو مەغزی دركاویو لەش خانە دەمارییەكانی تیادایە. |
| مادة بيضاء | White matter | مادەی سپی، چینی ناوەوەی مێشك، بریتییە لە كۆمەڵێك لە ریشاڵی دەماری نۆرە (دفعە) دەمارییەكان لە مێشكو مەغزی دركاوییدا دەگەیەنێت. |
| مادة التبريد | Refrigerant | مادەی ساردكردنەوە ، مادەیەكە بە شێوەی هۆیەك بەكاردێت لە كرداری كردن بە بەفرو بەستندا. |
| مادة مخثرة | Coagulant | مادەی مەیێنەر ، مادەیەكە یارمەتی مەیین یان خێراكردنی مەیین دەدات. |
| مادة نشطة | Active material | مادەی گورج، لە كیمیای كارەباییدا ئەو مادەیەیە كە رووبەكی گورج لەسەر ئەلكترۆدی پاتری پەیدا دەكات. |
| مادة ساحجة | Adrasive matter | مادەی كرێنەر. |
| مادة كاوية | Caustic | مادەی سوتێنەر، داخكەر ، وەكوو سۆدەی داخكەرو نیترانی زیو (بەردی دۆزەخ). |
| مادة حيوية – جبلة | Protoplasm | مادەی زیندوو. |
| مادة قابضة | Astringent | مادەی گیركەر، بە تایبەتی دژی سك چوون. |
| مادة تزييت | Lubricant | مادەی چەوركردن وەكوو گریس. |
| مادة عازلة | Insulating material | مادەی دابركەر، ئەو مادەیەی كە بەرهەڵستییەكی زۆری تێپەربوونی تەوژمی كارەبا دەكات، وەكو لاستیك. |
| مادة بين خلوية | Inter Celluar Substance | مادەی نێوان خانەكان، لە زیندەوەراندا. |

| | | |
|---|---|---|
| مادة صامدة | Refractory materia | مادەی بەرگەگر، هەر مادەیەك بەرهەڵستی گەرمی بكاتو بە ئاسانی شلەوە نەبێت وەكوو خشتی ئاگرین. |
| مادة قرنية = مادة متقرنة | Keratin | كیراتین، مادەیەكی پرۆتینیی‌یە لە سمو چڕنوكو نینۆكو پەڕدار هەیە. |
| مادة الخلايا التناسلية = جبلة جرثومية = جين | Germ- plasm | جین، پرۆتۆپلازمی خانە رەگەزیی‌یەكان كە رەوشتی كنێتی (زكماكی) دەگوێزنەوە لە دایكو باوكەوە بۆ نەوەكانیان. |
| مادة مطهرة | Abstergent | مادەی میكرۆب سستكەر. |
| مادة معقمة = مبيد للجراثيم | Steriliser | مادەی پاكژكەرەوە. |
| مادة حفازة | Catalyst | راجع (عامل مساعد). |
| مادة سامة | Toxin, toxic | مادەی ژەهر (ژەهرین). |
| مادة حية | Living matter | مادەی زیندوو. |
| مادة (موضوع) | Subject | مادە ، بابەت. |
| مادة طبية | Medical material | مادەی پزیشكی ، كە لە گرتنەوەی دەرماندا بەكاردێت. |
| مادة مستقرة | Stable substance | مادەی جێگیر، مادەی نەگۆڕ، هەر مادەیەك بەرهەڵستی شی بوونەوەو جیابوونەوە بكاتو بە ئاسانی كارلێك ئەكات لە پلەی گەرمی زۆر زۆر گەرمدا نەبێت. |
| مادبة | Banquet | ئاهەنگی نان خواردن. |
| مادي | Material = substantial | مادی،، هەرشتێك. پەیوەندی بە مادەوە هەبێت. |
| مادية | Madi = Tar weed | (مادی) گیایەكە لە وڵاتی شیلی دەڕوێت بە شێوەی پەینی سەوز بەكاردێت ڕۆنێك لە تۆوەكەی دەردەهێنرێت بۆ دروست كردنی سابون. |
| ماديرا | Madeira | مادیرا، جۆرێكە لە شەراب (مەی) لە دوورگەی مادیرای كەناری ئەفریقادا دروست دەكرێت. |
| مأذون، حكم | Umprie | قازی ، خاوەن بڕوانامەیەكی بەرز. |
| ماذي | White honey | هەنگوینی سپی ، هەنگوینی چاك. |
| مئذنة = ماذنة | Minare | منارە. |
| مار (مارة) | Passing-passerby | رێبوار ، هاموشۆكەر. |
| مارعويلا-شوكة الجمل | Syrian-Acanthus | كەرتەشی سوریا،ڕووەكێكی دڕكاوی‌یە. |
| ماربنو - مرينوس = خروف مارينو | Marino sheep | مێرینۆ، مەڕی ئیسپانیا ، جۆرە مەڕێكی بەناوبانگە بەوەی كە خوری‌یەكی زۆری نەرمو نۆڵی نایابی هەیە. |
| مارية - ارخ - بيسة-مها - ناشط هيطلة = أبو سولع - ابو حراب | Addax = Bedtrix = oryx | مانگا كێوی ، گیاندارێكی جوانی كاوێژكەرە چەند جۆرێكی هەیە جووتێك شاخی بێ لقی درێژی بەرزی هەیە لە ناوچە بیابانیەكاندا دەژی هەندێكی سپی‌یەو پەڵەی خەنەیی بە ناوچەوانو قاچی‌یەوە هەیە بە زۆری لە ئەفریقادا دەژی. |
| ماركانتيا | Marchantia | ماركانتیا، جۆرە ڕووەكێكە. |
| مارت - مارس | March | مارس، مانگی مارت ، ئازار ، نەورۆز ، سەرەتای بەهار، خاكە لێـ ٣ ڕۆژە (١-٢٠) ڕەشەمێ، (٢٠-٢١) نەورۆز. |
| مارن - خنابة | | نەرمایی لووت ، بەلگەی لووت ، دیواری ناو لووت. |
| ماريجوانا | MariJuana | ماریجوانا، جۆرێكە لە ڕووەكی گوشی هیندی، وەكوو بەنگو تلیاك دەكێشرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ماريـنر | Mariner | مارینەر، جۆرێکە لە کەشتی بۆشایی (مارینەر ١٠) بەلای هەسارەی (زهرە) دا رۆیشتووەو ٨و٢ ملیۆن کیلۆمەتر دوور بووە لێوەی. |
| ماراثون | Marathon | ماراثۆن جۆرێکە لە یاری ڕاکردن بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ کە هەندێك جار (٢٦) میلە. |
| مارتيني | Martini | مارتینی، جۆرێکە لە مەی لە جن و ڤێرموت دروست دەکرێت. |
| مــاروت = اقحــوان = اقحـوان خمـن = بـابونج نتن = شمر الكلب، نتن | Stinking chamomile = Maruta = Dog fennel = May weed | بەیبونە بۆگەنە، جۆرێکە لە بەیبون بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| مارغارين، المارجرين | Margarine | مارگارین، ڕۆنێکی تێکەڵاوە. |
| مارموسيت = قشة | Marmoset | مارمۆسێت، مەیمونێکی ئەمریکی بچووکە. |
| ماركة تجارية | Trade smark | جۆری بازرگانی. |
| مارماهي = مرمريج = انكليس = انقليس = قريث = حنكليس - نون - شكك - صلنباح | Commoneel = anguill = anguill Vulgar | (ئەنگویلا ڤۆلکاریس)، نقە، مارماسی ماسیەکی لاکێشەیی پانکەڵەیە سەری لاکێشەییە دادانی هەیە ڕەنگەکەی مەیلەو سەوزە وەکوو مار ژەهری هەیە. |
| ماركة - علامة | Mark | دامغە، شەقل ، مۆر ، باسمە. |
| مارش، لحن عسكري | March | مارش، ئاوازی ڕۆیشتن، ئاوازێکی سەربازییە. |
| مارشال-فريق - مشير | Marshal = martini | مارشاڵ ، پلەیەکی سەربازی گەورەیە. |
| مارج | Smoky flame | گڕی دوکەڵاویی. |
| مارج | Margay | مارجا، پشیلەیەکی شێوە پڵنگی ئەمریکی بچوکە. |
| مارب - غاية | Desire =wish-aim | مەبەست. |
| ماركاسيت - حجـر النار | Marcasite | مارکاسیت، کەرەسەیەکی خاوە ڕەنگەکەی زەردی مەیلەو سوورە لە ڕەنگی مس دەچێت. بریتییە لە دووەم گۆگردیدی ئاسن، وەکوو بەردێکی بە نرخ بەکاردێت. |
| مارخور | Markhor = Capra - Falconeri | مارخۆر، جۆرێکی گەورەیە لە بزنەکێوی دەڵێن کە گوایا مار دەخوات شاخەکەی پێچاو پێچە ، لە ئەفغانستان زۆرە. |
| مازوان | | (راجع قنا الهند). |
| مارد = عملاق = عرطل | Giant | چەتەوڵ، زەبەلاح. |
| مارستان= مستشفى الأمراض العقلية = مستشفى المجانين | Lunatic asylum | شێتخانە، خەستەخانەی شێتان ، خەستەخانەی نەخۆشی دەروونی. |
| مارمليد، مربى البرتقال | Marmalade | مرەبای پارچەو توێکڵی میوە، ڕەچاڵی توێکڵی میوە بە تایبەتی پرتەقاڵ. |
| مارة | Mara = Dolichotis = Patagonica | مارا گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە، لە دەشتەکانی ئەمریکا دەژی سەری بچوکە گوێچکەی گەورەیەو ملی درێژە قاچی باریکە ڕەنگەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە ژێر سکی سپییە توکەکەی نەرم و شلە بە شێوەی کۆمەڵە دەژی گیا دەخوات. |
| ماز = بيض النمل | Eggs of the ants | گەرای مێرووله. |
| مازوركا | Mazurka | مازۆرکا، سەمایەکی پۆڵەندییە. |
| مازريون - دفنة - مثنان | Mezereon = Narrow leaved daphne | تورز.جۆرە ڕووەکێکە. |

| | | |
|---|---|---|
| مازريون - دفنة سامة | Mezereon = Dwarf laurel = Spurge olive | حەوت بەرگ، زەیتونی زەوی ، رووەکێکە گوڵەکەی بۆن خۆشە بە رەنگی سپی یان سوور یان پەمەیی یان ئەرخەوانییە، بەرەکەی لە ترێ دەچێت سوورە، لە گەڵاو بەرەکەی مادەیەکی ژەهری پزیشکی دەردەهێنرێت گەڵاکەی شیرداره بۆ چارەکردنی فەرەنگیو ئاوبەندو زەردویی. |
| مازريون هندي = مبشرة الشتاء - بطرية - هريجة | Cliloria = Ternatea = meadow crocus | مازریون، بانە کۆتر، قیتکەیی، رووەکێکی تونکڵەکەی دەرمانی رۆماتیزمی لێ دەردەهێنرێت. |
| مازريون هندي - هرج = بظرية ترنات | Blue Clitoria = Butterfly pea | گیایەکی کشتوکاڵی خۆهەڵواسە گوڵەکەی گەورەو شینە لە هیندستان چێشتی برنجی پێ رەنگ دەکرێت. |
| مازور - صياد السمك - قرلي | Halcycon = King fisher | ماسیگرە، باڵندەیەکە. |
| مازور جبار | Laughing Jackass | قاژوو یان قەلەباچکە، باڵندەیەکە پشتی قاوەیییە، سکی خەنەیییە، باڵی شینە، ماسیو مارو مێروودەخوات. |
| مازوت - زيت الوقود | Oil fuel = Bunker Oil mazout = furance oil = heavy oil | گازۆیل، نەوتێکی قورس، شلەیەکی خەستە لە دڵۆپاندنی پەترۆڵ دەست گیر دەبێت، بە شێوەی سووتەمەنی بەکاردێت. |
| مازجة | Mixer | تێکەڵاوکەر. |
| مئزر | Mizar | ١) مێزار ، بەروانکە، پەشتەماڵ٢) ئەستێرەیەکی بریسکەدارە لە کۆهەسارەی وورچی گەورە. |
| مئزر | Coverage | بەروانکەی ئیش کردن. |
| مئزر - مريلة = ازار | Apron veil = Wrapper = Loincloth | مێزەر، بەروانکە ،چارۆکە، بەرکۆش، پەشتەماڵ ، پارچە قوماشێکە شەرمگەی پێ دادەپۆشرێت. |
| مئزاب = ميزاب | Gutter | ئاوەڕۆ. |
| ماس= ماسية = الماس - سامور | Diamond | ئەڵماس، جۆرێکە لە کاربۆنی کریستاڵی ، یەکەم مادەی پتەوی رەقە ، هەندێك جار رەنگاو رەنگە بە شێوەی گەوهەرێکی بە نرخ بەکاردێت. |
| ماسي الصلابة | Adamantine | هەر مادەیەك رەقیو بریسکەکەی وەکوو هی ئەڵماس وابێت. |
| ماس اسود | Carbonado | کاربۆنادۆ، ئەڵماسی رەش. |
| ماسة الزجاج | | ئەڵماسی شوشە برینەوە. |
| ماسخ = مسيخ | Tastelees = Vapid insipid | بێتام، هەر خواردنێك تامی نەبێت. |
| ماستيجور | Mastigure | ماستیجۆر، جۆرێکە لە مارمێلکە. |
| ماسوريوم - تكنيتيوم - تكنيسيوم | Masurium = technetium | ماسۆریۆم ، تەکنیتیۆم ، توخمێکی کانزاییە رەنگەکەی زیوی خۆڵەمێشییە کێشی ئەتۆمییەکەی =٩٨،٩٠ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٤٣) لە ئەنجامی داتلیشانی ئەتۆمی بۆرانیۆمو پلۆتۆنیوم پەیدا دەبێت نیشانەکەی (Ma) ، (Tc). |
| ماسك - ماسك عام | Clamp = holder = univer sal Clamb (clamp) | گیرە ، گرەر، مەقاش، گاسك. |
| ماسك جفنة | Crucible tongue | گیرەی بۆتە. |
| ماسك المصباح | Holder | گیرەی گڵۆپ. |
| ماسك انابيب | Test tube holder | گیرەی بۆری تاقیکردنەوە. |
| ماستريد | Masterid | ماستریید، دەرمانێکە بۆ چارەکردنی وەرەمی پێست لە سنگدا، بە شێوەی دەرزی هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| ماستيف - درواس | Mastiff | ماستیف، سەگێکی گەورەیە بۆ پاسەوانی بەکاردێت. |
| ماسوشي | Masochist | ماسۆشی، ئەو کەسەی تووشی نەخۆشی ماسۆشیزم بوبێت. |
| ماسوشية | Masochism | ماسۆشیزم، نەخۆشی‌یەکی دەروونییە، ئەو نەخۆشە (وەکوو پیاو) ئارەزووی ئەوە دەکات کە بەرامبەرەکەی (ئافرەتەکە) ئازاری بدات لە کاتی جووت کردن(گان کردن)دا ( کاری سێکسی) وا تا مێ ئازاری نێر بدات. ئەم وشەیە لەناوی ئەدیبی نەمساوی (ماسۆش)ەوە وەرگیراوە. |
| ماسورة | Tube = pipe | بۆری، لوولە، سەبیل. |
| ماسورة البخار | Steam pipe | بۆری هەڵم ، لوولەی هەڵم. |
| ماسورة البندقية | Gun barrel | لوولەی تفەنگ. |
| ماسورة مجاري | Sewer pipe = sewerage | بۆری زێراب، بۆری ئاوەڕۆ. |
| ماستودن - مستودون | Mastodon | ماستودۆن، گیاندارێکی قڕ تێ کەوتووە لە فیل چووە. |
| ماسح الأحذية | Shoe black =Boot black | بۆیاخچی پێڵاو. |
| ماسحة = مساحة = ممحاة | Rubber = eraser | سڕەوە، تەختەسڕ، لاستیکی خەت کوژاندنەوە. |
| ماسلة | Rushbed | قامیشەڵان، زونگاوێك. قامیش‌و زەلی تیادا ڕوابێت. |
| ماش- كشري - دجر صيني | Green gram = Black gram = Mung bean | ماش، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی پاقلە گوڵەکەی زەردی مەیلەو سەوزە بەرەکەی خڕو ڕەنگەکەی ڕەشی مەیلەو سەوزە دەکرێت بە چێشت. |
| ماش اخضر | Unriped green gram | تەڕەماش، فەریکەماش. |
| ماشة، ملقط | Tongs = pair of Tongs | مقاش،مقاشی ئاگر. |
| ماشية - مواشي =بهم - نعم | Cattle – livestock | ئاژەڵ، مەڕوماڵات، تەرش، ڕەشە ووڵاخ، وڵمات، ڕیەن. |
| ماشية اللحم | Beef Cattle | مەڕوماڵاتی گۆشت، ئەو مەڕوماڵاتەی بۆ گۆشتەکە بەخێو دەکرێن. |
| ماشية تسمين | Feeder Cattle | دابەستە، ئەو مەڕوماڵاتەی کە بۆ قەڵەوکردن بەخێودەکرێن. |
| ماشية اللبن | Milk cattle | ئەو مەڕوماڵاتەی کە بۆ شیرەکەیان بەخێو دەکرێن. |
| ماشي | Walker = pede strain | پیادە. |
| ماشط | Comb maker | شانەکەر، شانە دروست کەر. |
| ماشط، حلاق | Hairdresser | قژچاکەر، قژداهێنەر، دەلاك. |
| ماشطة - بلانة | Visiting ladys maid | قژبڕ، قژچاکەری ئافرەتان. |
| ماشولة - مدق الخوازيق | Pile driver | چەکوشی سنگ (مێخ) داکوتان. |
| ماص | Absor btive = absor beut | مژەر، مژۆك هەڵ قوڕ. |
| ماص | Absor bent | مژەر، ئەو تەنە ڕەقەی کە شلە یان گازی تیادا بڵاو دەبێتەوە. |
| ماص ماص للصوت = عازل الصوت | Sound proof | دەنگ مژ، دەنگ دابڕکەر. |
| ماص للحرارة | Endothermic | گەرمی مژ. |
| ماصة - الة امتصاص | Aspirator = pipet, pipette | مژەك، مژۆکە،ئامرازێکی شووشەیە وەك بۆری وایە پلەدارە بە مژین شلەی پێ دەگوێزرێتەوە. |
| ماصات | Siphono phores | مژەرەکان، دەم ئەلقەیی‌یەکان کۆمەڵێکن لە ماسی. |
| ماصة اللبن | Antlia lactea | مەمك مژە، ترومپای مەمك، مژۆکی شیر. |
| ماصر -ماصرة | Toll gate | گومرگ، فرمانگەی گومرگ. |

| | | |
|---|---|---|
| ماصول= مزمار كبير | Clariont | کلارنێت، زوڕنا. |
| ماضغ | Chewer | جووەر. |
| ماضر | Acescent = Sour | هەر مادەیەك یان شلەیەك بشێت بۆ ترش بوون. |
| ماضر = حامض | Sour | ترش، تامەکەی ترش بێت. |
| ماطر = ممطر | Rainy = wet =pluvious | باراناوی |
| ماعز - معز | Goat(ovis) | بزن ، خەزەڵ، چتیر، چوشتیر ، تەکە، سابرێن، گیسك، پەز، دوو جۆری هەیە مەرمزو سیاون. |
| ماعز الجبل - ماعز بري - بدن = وعل | Mountain-goat - wild goat ibex, ibex | بزنە کێوی ، جۆرە بزنێکی تیسکنە لە هاویندا تووکەکەی دەوەرێت. |
| ماعز أبلق | Piedald goat | شەعن، بزنی بەڵەك، پەڵەی رەش و سپی پێوەیە. |
| ماعز انقرة - مرعز - انكورا | Angora goat = mohair | بزنە مەرمز ،بزنی ئەنقەرە. بزنی ئەنگورا، مۆهێر، جۆرە بزنێکە تیسکەکەی درێژو سپی و نەرمو شلە لە ئاوریشم دەچێت. |
| ماعون - وعاء | Utensil = Vessel | قاپ ، دەوری. |
| ماغوط | Vermicide | دەرمانی لەناوبردنی کرم. |
| ماغما - صهارة | Magma | ماگما، مادەیەکی کەڤری تواوەیە لە ناخی زەویدا کە دەردەپەرێت و سارد دەبێتەوە کەڤری گڕکانی لێ پەیدا دەبێت. |
| مأفون | Moron | گێل، گەوج، گەوجەن ئەوەی رێژەی زیرەکی لە ٥٠-٦٩٪ بێت. |
| مافية | Mafia | مافیا، کۆمەڵەیەکی نهێنی‌یە لە تیرۆرستە سیاسی‌یەکان پێك دێت، بە زۆری لە تاوانبارەکان پیشەکەیان قاچاخچێتی مادەی بێ هۆشکەرو پارەسەندن لە خەڵکی بە زۆرو گەلێك ئیشی تری نایاسایی وەکوو قومار.. هتد ئەم کۆمەڵەیە لە زۆر ناوچەی جیهاندا پەیدا بووە. |
| منفاق - بريسكوب | Periscope | پێریسکۆپ، دووربینی ناسۆ لە کەشتی ژێر ئاوو مەتەرێزدا بەکاردێت. |
| م.ا.ف | Mev (or) M.E.V | ئێم ، ئەلف ، ڤی ، کورتەی دەستەواژەی (ملیۆن ئەلیکترۆن ڤۆڵت) ـە ، کە بریتی‌یە لە یەکەی ووزە. |
| ماق - ميق - موق العين | Inner Corner of the eye = Can thus | گۆشەی ناوەوەی چاو، قنچکی چاو. |
| ماقبل الجليدي | Preglacial | بەر لە سەهۆڵی سەردەمێکی جیۆلۆجی‌یە. |
| ما قبل الكمبري | Precambrian | دێرینی بەر لە کامبری، ئەو وەختە جیۆلۆجی‌یە کە دەکەوێتە پێش سەردەمی کامبری‌یەوە. |
| ماقة، تنهد | Sobbing | هەنیسك، هەنسك. |
| ماقية | Maackia | ماکیا، درەختێکە تەختەکەی رەق و قاوەیی‌یە گوڵەکەی بە شێوەی هێشووی سپی‌یە. |
| ماكاو | Macaw | ماکاو، جۆرێکە لە تووتی، رەنگەکەی زەردو شینە ، دەنوکەکەی بەهێزە تونکلی گوێزی هیندی پێ دەشکێنێت. |
| ماكاك - مكاك | Macaque = Macaco = Bonnet mcaque | ماکاك، جۆرە مەیموونێکی کلکدارە. |
| ماكاك ميمون - سعير | Pig tailed macaque | جۆرێکە لە مەیموونی ماکاك رەنگەکەی قاوەیی‌یە. |
| ماكاك الغابات | Wanderoo | ماکاکی دارستان، رەنگەکەی رەشە تەوقێك لە تووکی سپی وا بەدەوری ملی‌یەوە. |
| ماكاك رسيسي - بندر | Rhesus | رەسیس، جۆرێکە لە مەیموونی ماکاك. |

| | | |
|---|---|---|
| ماكسيديكس | Maxidex | ماكسيدێكس، جۆرێكە لە قەترەی چاو. |
| ماكسويل | Maxwell | ماكسويل، يەكەی لێشاوی موقناتيسی لە موقناتيسيەتی كارەباييدا. |
| ماكليكس | Maclex | ماكليكس، دەرمانێكە بۆ چارەسەركردنی ترشەڵۆكی گەدە.بە شێوەی حەبو شلە هەيە. |
| ماكنيتايت- أوكسيد الحديد المغناتيسي | Magnetite | ماگنيتيت، ئۆكسيدی ئاسنی موقناتيسی، كەرەسەيەكی خاوی ئاسنە رەنگەكەی رەشە، رەوشتی موقناتيسی هەيە. |
| ماكنة | Machine = Engine | مەكينە، ئامێر. |
| ماكنة ديزل | Diesel engine | مەكينەی (ديزل)، جۆرە مەكينەيەكە سوتەمەنیيەكەی لەناو خۆيدا دەسووتێت نەوتی رەش بەكار دەهێنێت. |
| ماكنة تعبئة القوارير | Bottling machine | مەكينەی بوتڵ پڕكردن. |
| ماكنة الحلب | Milker | مەكينەی شيردۆشين. |
| ماكنة تفتيت - ماكنة جرش | Comminutor | مەكينەی ووردكردن. |
| ماكنة ويمزهرست | Wimsherst | مەكينەی (ويمزهرست)، مەكينەيەكە بۆ كۆكردنەوەی كارەبای وەستاو. |
| ماكنة رش - مضخة رش - ماكنة رذاذة. | Vaporizer = sprayer | پەمپ،مەكينەی پرژاندن، مەكينەی پرژاندنی شلە. |
| ماكنة قص الثيل، الحشائش، محشة | Lawn- Mower = Mowing machine | مەكينەی چيمەن بڕ، چيمەن بڕ. |
| ماكنة الحلج | Cottongine | چرك، مەكينەی چيكەنە، چيكەنە، سيكەنە.مەكينەی هەلاجی. |
| ماكنة الحدل = محدلة، حادلة | Roll | مەكينەی تەخت كردنو ساف كردنی زەوی. |
| ماكنة كابسة | Press | مەكينەی پەستاوتن. |
| ماكنة ساحقة | Crushing machine | مەكينەی هاڕين. |
| ماكنة الأستنساخ - منساخ=بنتوغراف | Pantograph | پانتۆگراف، مەكينەی رەنووس كردن، ئامرازێكی رەنووس كردنی نوسينو وێنە بە گەورەيی يان بچووكی . |
| ماكنة سن، آلة الحد | Grinding machine | مەكينەی تيژكردن. |
| ماكنة كاشطة، كاسحة | Skimming machine | مەكينەی كراندن. |
| ماكنة حلاقة | Safety razor | مەكينەی ريش تاشين، مەكينەی تەراش. |
| ماكنـــــة ذات احتراق داخلي | Internal Combustion engine | مەكينەی سوتانی ناوەكی وەكوو لە ئوتومبێلدا. |
| ماكنة حفر دوارة = جهاز الحفر الرحوي | Rotary drilling machine | مەكينەيەكە بۆ كونكردنی زەوی بە هۆی ستونێكەوە بە دەوری خۆيدا دەخولێتەوە بە خێرايی بە هۆی قورسايی يان پەستانەوە. |
| ماكنة دراس = دراسة - نورج | Threshing machine | مەكينەی گێرە.مەكينەی گێرەكردن. |
| ماكنة خياطة = مخيطة | Sewing machine | مەكينەی دورمان. |
| ماكنة قلابة = عربة قلابة | Tipcart = tipper | مەكينەی هەڵ گێڕانەوە، گەلأبە. |
| ماكنة هزازة | Shaking machine | مەكينەی لەراندنەوە، مەكينەی شلەقاندن. |
| ماكنة البذار = مبذر | Sowing machine = seeder | مەكينەی تۆوكردن. |
| ماكنة الغزل | Spinning mill | مەكينەی رستن، خەرەك. |
| ماكنة قص الشعر | Hair Clipper | مەكينەی قژ برين، مەكينە سەرتاشين. |

| | | |
|---|---|---|
| ماكنة الخض | Jolting machine = churning machine | مەكینەی ژەندن، مەكینەی شڵەقاندن. |
| ماكنة تفقيس | Incubator | مەكینەی هەڵ هێنان، مەكینە جوجەڵە. |
| ماكنة بخارية | Steam engine | مەكینەی هەڵمی. |
| ماكنة الحصاد | Combine | كومباین، مەكینەی دروێنە. |
| ماكنة درفلة | Rolling mill | مەكینەیەكە بۆ پەستاوتن گوشین و راكێشانی شتومەك. |
| ماكيرودس | Machirodus | ماكیرۆدس، جۆرە پشیلەیەكی قر تێكەوتووە. |
| ماكيريل-اسقمري | MacKerel | ماكیریل-ماسی‌یەكی دەریایی‌یە. |
| ماكروز- ديكستران | Macrose = dextran | ماكرۆز،دیكستران،شەكرێكی چەندینەیە، لەكاتی شی‌كردنەوەی ئاوییدا گلوكۆزی لێ پەیدا دەبێت. |
| ماكل = طعام | Food = grub | خواردەمەنی چێشت. |
| ماكول | Edible = eatable | هەرشتێك بشێت بۆ خواردن. |
| ماكولات | Eatables, foods | خواردەمەنی. |
| ماكنيتومتر | Magneto meter | ماگنیتۆمەتر ، ئامرازی پێوانی هێزی كایەی موقناتیسی زەوی. |
| ماكي | | ماكی، جۆرە گیاندارێكی شیردەری كلك درێژە لە مەیمون و رێوی دەچێت. |
| مآل - نتيجة | Result | ئەنجام. |
| مال | Wealth | دارایی ، پارە ، سامان. ماڵ. |
| مالي | Financial | دارایی. |
| مالية | Financially | دارایی. |
| مالي = معبي | Filler | پڕكەرەوە. |
| مالاخيت - مالاكيت = ملاخيت دهنج | Malachite | مالاكیت، مەعدەنی مسی سەوز یەكێكە لە كەرەسە خاوەكانی مس مادەیەكی سەوزە بریتییە لە كاربۆناتی مسی تفت بۆ رەنگ كردن بەكاردێت. |
| مالات | Malate | ١) مالات، خوێی ترشی مالیك (ترشی سێو) ٢)بەردی نیمچە بە نرخ. |
| مالق= محدلة | Roll | باگردێن. |
| مالج - مسيعة | Trowells | ماڵە، ماڵەی قورەكاری ،كەمچە ، لێسە. |
| مالوش - حالوش | Mole Cricket | ملە، مۆڵە،جۆبركە، كوزبرگە، جۆرە مێروویەكی گەورەی باڵداری رەنگ قاوەیی‌یە لە كوللە دەچێت زیان بەخشە لەژێر زەویدا رەگی رووەك دەخوات. |
| مألوف | Familiar | ئاسایی، باو، گونجاو، شیاو. |
| مالف - موطن | Habitnat | شوێنەوار،شوێنەواری سروشتی گیاندارو رووەك. |
| مالتيز | Maltase | مالتێز، هەوێنێكە (ئەنزیمێكە) شەكری ماڵتۆز دەكات بە شەكری كلوكۆز. |
| مالتوز=مالطوز | Maltose | مالتۆز، شەكری جۆ، جۆرە شەكرێكە لە جۆدا هەیە. |
| مالح | Salty | سوێر، شۆر. |
| مالك = ملاك | Holder = owner = proprieter | خاوەن. |
| مالك الأرض | Land lord | خاوەن زەوی. |
| مالك الحزين = بلشون = ابن الماء - دنكلة - ابو العنقاء = حجفة - ارخياوي | Heron = grey heron | شاهۆ، شاوە، شاهۆكە، شینە شاهۆ، خەم خۆرە، شاوەبەڵەك، باڵندەیەكە لە تەنكاودا دەژی ، پەنجەكانی درێژە رەنگەكەی خۆڵەمێشی یان مەیلەو شین، مل و دەنووكی درێژە هەندێكی ملەكەی ئەرخەوانی‌یە لە عێراق و میسرو سۆداندا زۆرە. |

| | | |
|---|---|---|
| مالاريكس | Malarex | مالاریكس، دەرمانێكە بۆ چارەكردنی نەخۆشی لەرزوتا بە شێوەی حەب هەیە. |
| مالاثيون | Malathion = malalox | مالاثیون، دەرمانێكە بۆ قەلاچۆكردنی مێش و مەگەز. |
| مالانحوليا - مالينخوليا - ملنخوليا - ونخوليا - سوداء | Melancholia = melanecholy | میلانخۆلی، ماخۆلان،سەودا نەخۆشی ماتەمینی بە ترس و خەفەتەوە. |
| ماماة | Bleating | باڕاندن، باڕەبار، ماعاندن. |
| مامور | Ordered = officer = Commanded = official | فەرمانبەر، گزیر. |
| مامور البريد | Postman | فەرمانبەری پۆستەخانە. |
| مامورية | Mission | فرمانبەرێتی. |
| مامبا خضراء | Green mamba | مامبای سەوز، مارێكی ئەفریقی ژەهرینە. |
| مامبو | Mambo | مامبۆ، جۆرێكە لە سەما. |
| مالبيجي | Malpighian | ١) مالپیجی، پەیوەندی بە زانای توێكاری ئیتالی (مالپیجی) یەوە هەیە. ٢) چینێكە لە لەشی مرۆڤدا. |
| ماموث = صناجة = بهموث | Mammoth | ماموث، ماموس، فیلێكی كەتەی قرتێن كەوتووی تیسكن بووە، دوو كەڵبەی چەماوەی هەبووە، لە ئاسیاو ئەوروپادا ژیاوە، لاشەكەی لەژێر بەفردا لە ناوچەی سیبریادا دۆزراوەتەوە. |
| ماميثا | Glaucium = Horned popy | گلاوسیەم، خاشخاش شاخدار، گیایەكە لە كۆمەڵەی خاشخاش گوڵەكەی گەورەیە لە بەرەكەی جۆرە ڕۆنێك دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشكی وەكوو ڕۆنی خاشخاش بەكاردێت، گوڵەكەی سوور یان زەردە. |
| ماميلاريا | Dumpling Cactus | سوبێری كورت و خڕ. |
| ماميران = بقلة الخطاطيف = عروق صفر- عروق الصباغين | Swallow wort = Celandine | گیات پەرەسێلكە،، ڕەگەزەرد،ڕەگی بۆیە. |
| مانس = بانغولين = أم قرفة | Pangolin | پانگۆلین، گیاندارێكی شیردەری مێروولە خۆرە لەشی بە پوولەكەی ئەوتۆ داپۆشراوە لە پوولەكەی ماسی دەچێت. |
| مانع = مضاد = مقاوم | Inhibitive = anti | قەدەغەكەر، نەهێڵەر، دژ، دژ. |
| مانع الخبط = مانع القرقعة | Antiknock | دژی تەقەتەق، مادەیەكە ناهێڵێت تەقەتەق لە مەكینەی جوڵێنەری سوتانی ناوەكیدا ڕووبدات. |
| مانع التاكسد = مقاوم للتاكسد | Anti oxidan | دژی ئۆكسان ،دژی ئۆكسید بوون. |
| مانع الأستقطاب | Depolarizer | بەربەستی پۆل گرتن، لە كیمیایی كارەباییدا مادەیەكە ناهێڵێت پۆل گرتن ڕووبدات لە پیلی كارەباییدا. |
| مانع للقيء | Anti emetic | دژە ڕشانەوە. |
| مانع الصدمة | Antishock | دژی ڕاتەكاندن. |
| مـــــانع للحمـــــى | Antipyretic = Anti febrile = Alexipyretic | دژەتا.هەر دەرمانێك دژی تابێت. |
| مانع الرطوبة | Anti moisture = antihumidity | شێ‌گر، بەربەست كەری شێ، دژەشێ. |
| مانع الرغوة | Antifoaming agent | كاركەری دژی كەفكردن. |
| مانع للعرق | Anti hidrotic = anti hidrosis | دژی عارەق كردنەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| مانع التقيح | Antipyic | دژی کێم کردن. |
| مانع التجمد | Anti freeze | دژی بەستن، مادەیەکە دەکرێتە شلەوە بۆ نزمکردنەوەی پلەی بەستنەکەی. |
| مانع التخثر - مضاد للتخثر | Anti Coagulant | دژی مەین، دەرمانی دژی مەینی خوێن. |
| مانع الحمل | Anti pregnancy | دژی سك پڕبوون، دژی ئاوس بوون. |
| مانعة الصواعق - واقية الصواعق | Lightning = redconductor = lightning protector | تریشقەگر، بروسکەگر، ئامرازێکی بەربەستی هەورە تریشقە بۆ پاراستنی خانووبەرە. |
| مانومتر - مضغاط | Manometer | مانۆمەتر(١) ئامرازی پێوانی پەستانی هەڵم و گاز (٢) ئامرازی پێوانی پەستانی خوێن. |
| مانوليا | Magnolia | ماگنۆلیا، درەختێکی رازاندنەوەی جوانە، گەڵاکەی ئەستوورە گوڵەکەی سپی و گەورەیە. |
| مانوز | Mannose | مانۆز، شەکرێکە لە ئۆکساندنی ئەلکهولی مانیتۆل پەیدا دەبێت لە بەری خرنووك و پرتەقاڵدا هەیە. |
| مانجروف | Mangrove | مانگرۆف، دارو دەوەنێکی ناوچە گەرمەکانە لە زەوی فشەڵی قوراییدا دەڕوێت، لە نزیك رێژگەی دەریاکاندا، لە خوارەوە لە لقەکانییەوە رەگی هەوایی زۆر دەردەکات، بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە رێگە لە هاتوچۆی مرۆڤ دەگرێت لەبەر ئەوە پێی دەوترێت (رووەکی گۆڕستانی مرۆڤ). |
| مانجا = مانغا - مانجو - عنبة = انبة - منجا - منغا - منجو- منغو = انبج - عنبا | Mango | مانگۆ، عەمبە، مانگە، درەختێکە گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویەکی سوورە بەرەکەی لە گورچیلە دەچێت گەورەیە رەنگەکەی سەوزی مەیلەو زەرد یان سوورە دەخورێت یان دەکرێت بە ترشیات یان مرەبا. |
| ماندولين | Mandolin | ماندۆلین، جۆرێکە لە ئامرازی عود. |
| ماندليت الكالسيوم | Calcium mandelate $Ca(C_8H_7O_3)_2$ | ماندیلایتی کالسیوم، تۆزێکی سپی بێ بۆنە، لە مەیدانی پزیشکێتیو دەرمانسازیدا بەکاردێت. |
| ماندیلامین | Mande lamine | ماندیلامین، دەرمانێکە دژی بەکتریا بۆ پاکژکردنەوەی میز بەکاردێت بە شێوەی حەب هەیە. |
| ماندريل | Mandrill | ماندریل،مەیمونێکی کەتەی زیانبەخشە لە خۆرئاوای ئەفریقادا دەژی. |
| مانيوق = مينهوت - كاساڤا | Manioc = Manihot = Cassava | مانیۆك، مانیهۆت، کاساڤا دەوەنێکە لە رەگە ئەستورەکەی مادەیەکی نیشاستەیی خۆراکی چاك دەردەهێنرێت. |
| ماينب | Maneb | مانیب، دەرمانێکە ، بۆ چارەکردنی نەخۆشی رووەکی. |
| مانيزيوم- مغنيسيوم | Magnesium | مەگنیسیۆم، توخمی مەگنیسیۆم. |
| مانيزيا- مغنيسيا - مانيزا - مغنيزا | Magnesia = periclase | مەگنیسیا، ئۆکسیدی مەگنیسیۆم. |
| ماندينغ | Mandingo | ماندینگۆ، رەگەزی قولەڕەش لە خۆرئاوای ئەفریقا دەژی. |
| مانهاتان | Manhattan | مانهاتان، جۆرێکە لە مەی تێکەڵاوە لەڤێرموت و ویسکی .. هتد. |
| مانيلين | Manilin | مانیلین، دەرمانێکە دژی میکرۆب بەکاردێت بە شێوەی گولاج و شلە هەیە. |
| مانيخوليا =الانقباضية، نزوع الى الحزن ملنخوليا - سوداء | Melancholy = melancholia | راجع مالانخوليا= ماخۆلان |
| مانيخوليا الحيوان | | سایمە. |
| مانكين = منكين | Manikin = mannikin | مانیکان، پەیکەری پیشان دانی جلوبەرگ. |

| | | |
|---|---|---|
| مرشد جيروسكوبي = مقر جيروسكوبي | Gyrostabilizer | جايرو ستابيليزەر، ئامرازێکە بۆ پاراستنی لەنگەرگرتنی فڕۆکەو کەشتی. |
| مرصد = مرصاد = مرقب | Observatory | ڕووانگـە، کالینکـا، کالیتکـە، کۆپیتـە، دەزگایەکـە بـۆ تـێڕوانینی ئەستێرەکان. |
| مرصد فلكي مداري | Orbiting Astronemy | ڕووانگەی ئەستێرەوانی خولگەیی، دەنێرێتە دەرەوە بۆ خوێندنی تیشکی سەرووبنەوشەیی لە ئەستێرەکان. |
| مرصد جوي = مرصاد جوي = مرقب جوي | Meteorological observatory | (١) ڕوانگەی کەش، شوێنێکە دەزگاو ئامرازی تایبەتی تیادایە بۆ زانینی بارەکانی کەش.<br>(٢) شوێنی خوێندنی باری ئەستێرەکان. |
| مرصد مداري | Orbiting observatory | ڕووانگەی خولگەیی. |
| مرصد مداري شمسي | Orbiting solar observatory | ڕوانگەی خولگـەیی خۆریـی، ئـەم ڕوانگەیـە دەنێررێتـە بۆشـایی دەرەوەی بەرگی هەوای زەوی بۆ لێکۆڵینەوە لە خۆر. |
| مرصد مجسم = مجسام مقرابي | Telestereo scope | تەلیستریوسکۆپ، جۆرە تەلیسکۆپێکە ئەستێرەکان بە شێوەیەکی تـەنداری پیشان دەدات. |
| مرصن ميسم | Branding iron | شیش داخ کردن، شیش مۆرکردن. |
| مرصاع = نحلة = دوامة = خذروف | Top | مزراح. |
| مرصع | Inlaid with Jewels | گەوهەربەند. |
| مرصع | Mounted (or) set with | نقێم بەند، وەکوو تەڵایەکی زێڕ یان زیوو، بە نقێم ڕازانرابێتەوە. |
| مرصوص | Compact = Compressed | پێکەوە نووساو، پێکەوە بەستراو، پەستێنراو. |
| مرصدة = مرصد الطائر | Meterograph | وێنـەگری کـەش، دەزگایـەکی ووردە بـە شـێوەیەکی ئۆتۆمـاتیکی پلـەی گەرمیو پەستانو شێی بەرگی هەوای دەورووپشتی زەوی تۆمار دەکات بە باڵۆنێکدا هەڵ دەواسرێت کە پڕە لە هایدرۆجین. |
| مرض = وصم | Disease = illness = sickness = Ailment = Malady = Invalids = Malum | نەخۆشی، دەرد |
| مرضعة = ظئر | Nurse = wetnurse | دایەن، ئەو ژنەی کە شیر دەدات بە منداڵان. |
| مرضي | Pathological = mor bid | نەخۆشییانە هەرشتێك، پەیوەندی بە نەخۆشییەوە هەبێت. |
| مرض الأظلاف (في المواشي) = تعفن الظلف = مرض الباغة = العظم الحلقي | Fotrot = ringbone | تەبەق، شقاقی، شوقاقی، مازیر، باغەی جارەوێ، نەخۆشییەکە کە دەدات لە سمی ئاژەڵو لە کەلکی دەخات. |
| مرض الرقص السنجي = كوريا = خوريا = زفن | Chorea | خۆریا، نەخۆشییەکی دەماری درمە لەرزین لە دەموچاوو پەلەکاندا پەیدا دەکات. |
| مرض السراجة = سقاوة = رعام = ذيبة الخيل = مرض الخيول | Farcy , equina-farcina | نوفە، سەقاو، مەقاو، مرخە، پزوو، نەخۆشییەکی درمو ترسناکە، توشی وولاخو ئاژەڵ دەبێت برین لە پێستی لووتو ئەندامەکانی هەناسەدانیدا پەیدا دەبێت، کێم بە لووتیدا دێتە خوارەوە. |
| مرض الحمل والجدي | | (باوڵی) نەخۆشییەکە تووشی بەرخو کارژۆلە دەبێت. |
| مرض الزيمير | Alzheimers-disease | نەخۆشی (ئەلزیمیر) شێوەیەکە لە شێوەکانی شێتی لە ئـەنجامی پووکانـەوەی بەشـی پێشـەوەی (ناوچـەوان) مێشـکەوە پـەیدا دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| مرض اميلويد = المرض الشمعي = فساد نشوي | Amyloid-disease | نەخۆشی مۆمی، گەندە نیشاستە ، بریتی‌یە لە گەندی‌یەك لـە گورچیلـەو سپڵ و جگەردا بە هۆی كیماوی بوونێكی كۆن لە ئێسكدا یان سیلی كۆنەوە ئەندامەكـە گـەورە دەبێـت لـە ئـەنجامی نیشـتنی مادەیـەكی روون كـە لـە نیشاستە دەچێت لە شانەكاندا. |
| مرض الكحول | Dip somania | نەخۆشی تینوێـتی ئەلكـهول، تامـەزرۆیی ئەلكـهول، نەخۆشـەكە هەمیشـە ئارەزووی خواردنەوەی مەی دەكات. |
| مرض زلال البول = مرض البول الزلالي | Bright s disease | نەخۆشی‌ی پرۆتینی میز، نەخۆشی (برایت). |
| مرض بازن = صدفية الشدق | Bazins disease | نەخۆشی بازن، سووتانەوەیەكی بە تینە زۆر دەوام دەكات بە تایبـەتی لـە قاچی ژندا گرێی قووڵ لە پێستدا پەیدا دەبێت لە دواییدا كێم دەكات. |
| مرض بارلو | Barlows disease | نەخۆشی‌ی بارلۆ، نەخۆشی ئێسكەربووتی منالان. |
| مرض بانتيس | Bantis disease | نەخۆشی بـانتیس، نەخۆشی‌یەكە خوێـن پژانـی گـەدەو ریخۆڵـەو كـەم خوێنی و پاڵەپەستۆی خوێن هێنەری گوێزەرەوەی لە گەڵدایە. |
| مرض كالازار • | Kalazar, lack fever | نەخۆشـی‌ی كـالازار، نەخۆشی‌یەكی دەرمـە نـاو بـەناو تـاو ئەسـتووربوونی جگەری لە گەڵدایە. |
| مرض الأسوداد = مرض القتام | Melanose | نەخۆشـــی رەش بوونـــی گـــەنم و مێـــو (تـــرێ) بـــەهۆی كـــەڕووی میكرۆسكۆپی‌یەوە. |
| مرض الحنين الى الوطن = مرض نفسي | Home sick | دەردی دووری. دەغەز، نەخۆشی دووره وڵاتی، نەخۆشی‌یەكی دەروونی‌یە. |
| مرض الذباب | | نەخۆشی مێش، نەخۆشی‌یەكە لە ئوستورالیادا بڵاو دەبێتـەوە نیشانەكانی دڵ تێكەڵ هەڵاتن و رشانەوەیە. |
| مرض كبد الحيوان = مرض دودة الكبد | Distomiasis = liver fluke disease | نەخۆشی كرمی جگەر، نەخۆشی‌یەكە لە مەرومالاتدا دەبێت بەهۆی كرمی جگەرەوە. |
| مرض عرف الدجاج | | پۆپەرەشە، پۆپنەرەشە.نەخۆشی‌یەكە لەناو پەلەوەردا بڵاو دەبێتەوە. |
| مرض وراثي | Hereditary illness | نەخۆشی زكماكی. نەخۆشی كنێتی |
| مرض متوطن = مرض مستوطن | Endemic disease | نەخۆشی نیشتەجێ، هەندێك نەخۆشی هەن كە بە زۆری لە ناوچەیەك دا دادەكەون وەكوو نەخۆشی كۆلێرا لە هیندستان. |
| مرض المعدة | Dyspepsia | نەخۆشی گەدە. |
| مرض الزهري = سفلس، افرنجي | Syphilosis | فەرەنگی. |
| مرض العفص | Gall sickness | نەخۆشی مازوو، نەخۆشی‌یەكە تووشی ئاژەڵ دەبێت بە هۆی گەنمەوە(قراد) بڵاو دەبێتەوە. |
| مرض الدم | Nocohaemia mia = noso hemia | نەخۆشی خوێن. |
| مرض العضلة | Myonosus | نەخۆشی ماسولكە. |
| مرض العظم | Osteonosus | نەخۆشی ئێسك. |
| مرض فطري | NosomyCosis | نەخۆشی كەڕوویی. |
| مرض النوم الأفريقي | Lethargos | نەخۆشی نوستنی ئەفریقی. |
| مرض تجعد الأوراق | Leaf Curl | چرچە گەڵا، گەڵا چرچە، نەخۆشی‌یەكی رووەكی‌یە. |
| مرض الشهبة | Blister disease | نەخۆشی‌یەكی رووەكی‌یە بە هۆی ئەسپێیەكی تایبەتی یەوە دەبێت. |
| مرض الربو | Asthma | نەخۆشی بەرهەنگ. |

| | | |
|---|---|---|
| مرض هوجكن، مرض هدجكن | Hodghins disease = lympha denoma | نەخۆشی هۆجکن، بریتی‌یە لە ئاوسانی گرێو لووە لیمفی‌یەکانو سپڵو ئێسکو مەغز بەڵام ئێشو ئازاری لە گەڵدا نی‌یە ئەگەر چارە نەکرێت دەبێتە هۆی مردن. |
| مرض البثور الساري = درميت | Poll-evil | نەخۆشی‌یەکی درمە تووشی وولاغو مانگا دەبێت. |
| مرض الحراشف | Lepidor thosis | نەخۆشی‌یەکی میکرۆبی‌یە تووشی پوولەکەی ماسی دەبێت. |
| مرض الصحن | Sand crack = sole sore | تەبەق نەخۆشی‌یەکە لەژێر سمی وولاغ دەدات. |
| مرض الفطر الشعاعي = حاروش = مرض الحارش | Actinomy Cosis | ئەکتینومایکوسیس، نەخۆشی‌یەکە تووشی ئاژەڵ دەبێتو دەچێت بۆ مرۆڤ، بە هۆی کەڕووی تیشکی‌یەوە، لە نیشانەکانی پەیدابوونی گرێ لە شەویلگەو زماندا. |
| مرض القمل | Phthiriasis | نەخۆشی ئەسپێ، هەر نەخۆشی‌یەك لە ئەنجامی مێرووی وەکوو ئەسپێو گەنەوە داکەوێت. |
| مرض بكتري | Bacterial illness | نەخۆشی باکتریایی، نەخۆشی‌یەك بەهۆی باکتریاوە بێت. |
| مرض فطري | Cyryptogamic-disease | نەخۆشی کەڕوویی، هەر نەخۆشی‌یەك کە لە کەڕووەوە دابکەوێت. |
| مرض النوم | Nagana = Trypanosom–iasis = sleeping sicknes | ناگانا، نوخۆشی نووستن، نەخۆشی‌یەکی درمە بەهۆی مێشی(تسی تسی) یەوە بڵاو دەبێتەوە نەخۆشەکە سست دەبێتو جاری وا هەیە دەمرێت. |
| مرض معدي = مرض ساري وباء | Infectious disease = Communicable disease = Contagious disease | نەخۆشی درم، نەخۆشی تەشەنە کار، ئەو نەخۆشی‌یەی کە بڵاو دەبێتەوە لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر یان لە گیاندارێکەوە بۆ گیاندارێکی تر. |
| مرض مزمن | Chronic = Macronosia | ژاری، نەخۆشی درێژخایەن، نەخۆشی‌یەك کەزۆر بخایەنێت. |
| مرض عضال | Incurable disease | دەردی بێ دەرمان، دەردی بێ چاری. |
| مرض فسلجي | Physiologic disease | نەخۆشی (فسیولۆجی) ، نەخۆشی فرمانی ئەو نەخۆشی‌یەی کە پەیوەندی نی‌یە بە میکرۆبەوە درم نی‌یە بەڵکو پەیوەندی هەیە بە ئیشوکاری ئەندامەکانی لەشەوە وەکوو نەخۆشی شەکر. |
| مرض الساق الأسود = مرض اسوداد الساق | Black shank | قەدەڕەشە، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە، تووشی توتن دەبێت، بەهۆی جۆرە کە رووێکەوە، رەگو قەدەکەی رەشو بۆگەن دەبێتو دەمرێت. |
| مرض الجرب | Scab | گەڕی، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە. |
| مرض جرب التفاح | Apple scab | نەخۆشی گەڕی سێو، نەخۆشی‌یەکە تووشی سێو دەبێت بەهۆی هەندێك کەڕووەوە، پەڵەی رەشو گەورە لەسەر گەڵاو بەرەکەی پەیدا دەبێت. |
| مرض شاجا | Chagas disease | نەخۆشی (شاجا) = بەهۆی مشەخۆری تریپانۆسۆماوە لە رێگەی هەندێك مێشولەوە میکرۆبەکەی لە خوێندا بڵاو دەبێتەوە، دەبێتە هۆی ئاوسانی لووتو ملو رووتانەوەی قژو تووکی ردێن، هەروەها دڵو لووی لیمفی تووشی دەکات. |
| مرض جلدي | Skin-disease = dermatosis | نەخۆشی پێست. |
| مرض بسيط = وعكة | Haplopathy = Indisposition | نەخۆشی‌یەکی سووکەڵە. |
| مرض نزق الدم الوراثي | Haemophillia | هیمۆفیلیا، خوێن پژانی کنێتی، خوێن پژانی زکماکی. |
| مرض عصبي = عصاب | Neuropathy | نەخۆشی دەماری. |
| مرض نفسي عصبي | Neuropsy chosis | نەخۆشی دەروونی دەماریی. |
| مرض عصبي وظيفي | Neurosis | نەخۆشی فرمانی دەماریی. |
| مرض المبيض | Ovariopathy | نەخۆشی هێلکەدان (لە ئافرەتدا). |
| مرض مهني | Occupation disease | نەخۆشی پیشەیی، واتە نەخۆشی‌یەك پەیوەندی بە پیشەی ئەو کەسەوە هەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| مرض حاد | Acute disease | نەخۆشی‌یەکی تیژ، واتە خێرا پەیدا دەبێت. |
| (مرض الأظافر) | Ony chosis | نەخۆشی نینۆك. |
| مرض الأذن | Otopathy | نەخۆشی گوێچکە. |
| مرض البلاكرا = داء الذرة = بلاجرا | Pellagra | ( پلاگرا)، نەخۆشی‌یەکە لە ئەنجامی کەمی ڤیتامین(B) یەوە دەبێت لە نیشانەکانی ئازاری گەدەو سووتانەوەی پێستو دەمارە. |
| مرض عقلي | Phrenopath | نەخۆشی ژیریی. |
| مرض وهمي | Pseudo malady | نەخۆشی وەهمی، نەخۆشی ئەندێشەیی. |
| مرض الحمى الفحمية = حمى فحمية = جمرة خبيثة = حمى جمراوية | Anthrax | سپلە، ئاگرە، هەولە، نەخۆشی‌یەکی درمی کوشندەیە تووشی وڵاخو مرۆڤ دەبێت، گیانەوەرەکە هەناسەی خێرا دەبێتو قاچی شل دەبێتو دەکەوێتو خوێنێکی رەش لە لووتو کۆمی یەوە دێتە دەرەوە. |
| مرض القلب | Cardiopath | نەخۆشی دڵ. |
| مرض المخ | Cerebnopathy | نەخۆشی مێشك. |
| مرض صفراوي | Cholosis | نەخۆشی زراو. |
| مرض جلدي | Dermatosis | نەخۆشی پێست. |
| مرض العملقة | Giantism Gigantism | نەخۆشی زەبەلاحی، نەخۆشی چەتەوڵی. |
| مرض المعدة | Gastropathy | نەخۆشی گەدە. |
| مرض القزمية | Dwarfism | نەخۆشی کورتە بنەیی. |
| مرض الغدة الدرقية | Goiter = Thyiditis | نەخۆشی گۆیتەر نەخۆشی لووی سایرۆید( کە دەکەوێتە ئەم لاو ئەو لای قورقوڕاگەوە). |
| مرض حيواني | Zoonosis | نەخۆشی گیانەوەر. |
| (مرض مفاجيء) | Sudden disease | نەخۆشی کتوپڕ |
| مرض التصمغ | Brownrot Gummosis | نەخۆشی زەمقاوی بوون، دەرکەوتنی مادەیەکی زەمقی لەسەر توێکڵی قەدی درەخت رەنگەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە. |
| مرض الاسهال الأبيض | Pullorumdisease | ریقنە سپیکە، نەخۆشی‌یەکە تووشی باڵندەی وەکوو مریشك دەبێت. |
| مرض السكر = مرض البول السكري | Diabetes | نەخۆشی شەکر، ئەگەر هۆرمۆنی (ئەنسولین) کەم بێت شەکری کلوکوز لە لەشدا ناسووتێت بۆ پەیداکردنی ووزە لەبەر ئەوە شەکرەکە لەگەڵ میزدا دێتە دەرەوە. |
| مرض صدري | Thorocopathia | نەخۆشی سنگ. |
| مرض برايت | Bright disease | نەخۆشی برایت، نەخۆشی‌یەکانی گورچیلە کە تیایاندا پرۆتین لە میزدا دەردەکەوێت زۆرجا ئاوبەندی لەگەڵدایە. |
| مرض الصدا = شقران | Rust | نەخۆشی ژەنگ، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە لە مێودا دەبێت ووشکی دەکات. |
| مرض سيموند | Simmonds disease | نەخۆشی سیمۆند، نەخۆشی‌یەکە بە زۆری لەناو ئافرەتاندا بڵاو دەبێتەوە، بریتی‌یە لە لاوازبوونی لەشی بەهۆی سستی (لووی پیتویتەری) یەوە کە دەکەوێتە ژێر مێشکەوە، نەخۆشەکە زوو پیر دەبێت. |
| مرض ازرق | Blue disease | نەخۆشی‌یە شینکە، شین بوونەوەی منداڵ لە کاتی لە دایك بووندا بە هۆی نەخۆشی‌ی دڵ یان خوێنبەری سی‌یەوە. |
| مرض الفيلاريا | Filariasis | نەخۆشی فیلاریا، بوونی کرمی فیلاریا لە خوێندا. |
| مرض ريجا | Rigas disease | نەخۆشی ریجا، سوتانەوەو برینداربوونی ناودەم. |

| | | |
|---|---|---|
| مرض اديسون - مرض الكظر | Addisons disease | نەخۆشەکە نەدیسون، بریتییە لە ئاوسانی لووەکانی سەر گورچیلە (کظر)و خوێن کەمی، رەنگی پێستی نەخۆشە وەك رەنگی مسی لێ دێت، لە نیشانەکانی : ماندوو بوون و لاوازیی و نزم بوونەوەی پەستانی خوێنە. |
| مرض پۆت | Potts disease = spinal caries | نەخۆشی پۆت، کون بوونی بڕبڕەی پشت. |
| مرض فايل | Weils disease | نەخۆشی ڤایل،جۆرێکی پیسە لە نەخۆشی زەردوویی. |
| مرض جلينار | Glenard-dis | نەخۆشی گلینارد، داکەوتنی هەناوی مرۆڤ. |
| مرض شيلدر | Schilders dis | نەخۆشی شیلدەر، نەخۆشییەکە لەمێشکدا بە هۆی سوتانەوەی دەماری چاوەوە روو دەدات، دەبێتە هۆی کوێری. |
| مرض البول المائي | | میزی ئاوی، ئەم نەخۆشییە لە ئەنجامی کەمی هۆرمۆنی (لوی پیتویتەری) یەوە دەبێت، نەخۆشەکە زۆر میز دەکات و زۆر تینوی دەبێت. |
| مرض الأذن في المواشي | | شەوت، ئازارێکە تووشی گوێچکەی ئاژەڵ دەبێت. |
| مرض الجالب | Bunt of wheat | نەخۆشییەکی رووەکییە تووشی گەنم و جۆ دەبێت تووەکەی وەکوو خۆڵێکی رەشی لێدێت. |
| مرض تبقع الأوراق | Leaf spot | پەڵەی گەڵا ، پەڵاویی بوونی گەڵا نەخۆشییەکی رووەکییە. |
| مرض الولوات | Vibriosis | نەخۆشییەکە بە هۆی باکتریاوە دەردەکەوێت ، نەخۆشییەکی رەگەزی درمە لەناو ئاژەڵدا بڵاو دەبێتەوە. |
| مرض الفطر العنقودي | Botryomy cosos | نەخۆشی کەڕووی هێشوویی. |
| مرض الصدر(في الدواب) | | چوپلەمە، نەخۆشی سنگی ئاژەڵ. |
| مرض الزور العفن | Septicsor throat | نەخۆشی کەڕووە بۆگەنە. |
| مرض المسمار | | سنان، سنگان،دەردێکە دەدات لە هەموو جۆرە میوەیەك وەکوو سێوو کاڵەك و ترۆزی وەکو مێخەکە وایە لە لەشی مرۆڤدا. |
| مرض خبيث | Cacopathia | نەخۆشییەکی پیس. |
| مرض وبائي | Epidemic disease = pesilience | پەتا، ئەو نەخۆشییەی کە دەرەو ناوچەیەکی گەورە لە هەمان کاتدا دەگرێتەوە. |
| مرض الرئة (في الأغنام) | | تریفە، نەخۆشی جگەر لە مەڕو ماڵاتدا. |
| مرض الأعجار | | پووکانەوەی ئەندامی نێرەکی و لاوازبوونی هێزی پ یاوەتی لە مرۆڤدا. |
| مرض البحر - هدام | Sea sickness | سەرە خولەی دەریا، سەرە گێژەی دەریا، نەخۆشی گێژبوونی مرۆڤ لە دەریادا. |
| مرض الوثب | | نەخۆشی بازدان، نەخۆشییەکە تووشی مەڕوماڵات دەبێت بە هۆی کرمێکی مشەخۆرەوە. |
| مرض المفاصل | Pheoma ticky | نەخۆشی جومگە، نەخۆشی نەقرس، نەخۆشی پاشاکان(یان نەخۆشی شاکان). |
| مرض العضلات | Myo pathy | نەخۆشی ماسولکە. |
| مرض الأصفرار | | نەخشی زەردبوون، زەکۆیی، نەخۆشی زەرد هەڵگەران، زەردبوونی گەڵای رووەك بەهۆی کەمی مادەی (کلۆرۆفیلی) سەوزینەوە. |
| مرض الأفرازات | | نەخۆشی دەردان، دەردانی مادەی هەمەرەنگ لە لەشی رووەکەوە. |
| مرض البياض | Mildew | نەخۆشی سپی واشی، نەخۆشییە سپیکە، نەخۆشی سپی هەڵگەران، نەخۆشییەکی رووەکییە بە هۆی کە رووەوە دەبێت گەڵاکەی بە پەردەیەکی سپی یان خۆڵەمێشی دادەپۆشرێت. |
| مرض البياض الدقيقي - ارمداد الكرم | Vine mildew | رزینی مێو، نەخۆشییەکی رووەکییە بە هۆی کەڕووەوە دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| مرض البياض الدقيقي | Powdery mildew | دۆوکە، ئاردە سپیکە، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە. |
| مرض البياض الزغبي | Downy mildew | مووە سپی‌کە، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە. |
| مرض الكوريزا | | نەخۆشی کوریزا، نەخۆشی ومناقی باڵندە. |
| مرض التجعد | Exoscales curl | نەخۆشی چرچی، چرچ بوونی گەڵای درەختی بەردار بەهۆی کەڕووەوە. |
| مرض متوطن | Endemic disease | نەخۆشی نیشتەجێ، واتە بەردەوام بوونی نەخۆشی یەك لە شوێنێکی تایبەتیدا وەکو نەخۆشی مەلاریا لە ناوچە گەرمەکاندا. |
| مرض الصندوق | Bends = caisson disease = Decompre-ssion illness | نەخۆشی سندوق، لە نیشانەکانی ئازارێکی بەتین لە قاچ و سکدا یان ئیفلیجی قاچەکان بە هۆی نزمبوونەوەیەکی خێرا لە پەستانی هەوای سەرلەش وە ئەمەش دەبێتە هۆی پەیدابوونی بڵقی گازی نایتروجین لە خوێندا بە تایبەتی ئەوانەی دەچنە ژێر ئاو یان دەفڕن یان لە کانەکاندا کاردەکەن، نەخۆشەکە دەخرێتە سندووقەوە. |
| مـرض فردريـك = تخلج وراثي | Hereditary-ataxia = Freidreichs disease | نەخۆشی فەرەدریك، نەخۆشی‌یەکی زگماکی‌یە لە مێشکۆلەدا لە منداڵاندا دەردەکەوێت. |
| مرض زهري | Venereal disease | نەخۆشی رەگەزی ، ئەو نەخۆشی‌یەی کە ئەندامە رەگەزی‌یەکان تووشی دەبن بە زۆریی لە رێگەی جووت گرتنەوە وەکوو نەخۆشی سوزەنەك و فەرەنگی. |
| مرض لوكو | Loco-disease | نەخۆشی لۆکۆ، نەخۆشی‌یەکە وڵاخ و ئاژەڵ تووشی دەبن بە هۆی خواردنی گیای ئەستراگا– لەسەوە. |
| مرض اللبن | Milk sickness | نەخۆشی شیر، لە ئەنجامی خواردنەوەی شیری ئەو ئاژەڵەوە روو دەدات کە رەگی رووەکی تایبەتی ماری سپی خواردبێت. |
| مرض التحنط | | نەخۆشی مۆمیا، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە بەرەکەی وشك و چرچ دەبێت وەکوو لە قۆخ دا روودەدات. |
| مرض بستوري | Pasteurellosis | نەخۆشی پاستیورلۆسیس، چەند نەخۆشی‌یەکی درمە بەهۆی میکرۆبی تایبەتی‌یەوە دەبێت، وەکوو سوتانەوەی سی (ذات الرئة) لە وڵاخ و ئاگرە لە مریشك و سك چوون لە گوێرەکەدا. |
| مرض البثور الساري | Poll-evil | نەخۆشی زیپکەی درم، نەخۆشی‌یەکی درمە تووشی وڵاخ و مانگا دەبێت، زیپکە لە نێوانی هەردوو شاخەکەیدا پەیدا دەبێت لە دواییدا دەبێت بە دومەڵ. |
| مرض الموزاييك | Mosaic | نەخۆشی مۆزاییك، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە رەنگی گەڵاکەی دەگۆڕێت، بۆ سەوزێکی تێر یان کاڵ یان زەرد یان سپی بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە لە مۆزاییك دەچێت، بەهۆی میکرۆبی (ڤایرەس) ەوە وەکوو لە تووتن و لۆکەدا. |
| مرض البثرة | | نەخۆشی زیپکە نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە، گرێ لەسەر قەدو گەڵا پەیدا دەکات، کاتێك کە گرێکە دەدڕێت میکرۆبەکانی بڵاودەبێتەوە. |
| مرض العفن الأزرق | Blue mold | کەڕووە شینە، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە. |
| مرض الانتراكنوز | Anthracnose | ئەنتراکنۆز، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە پەڵەی خۆڵەمێش لەسەر میوە پەیدا دەکات. |
| مرض العفن الأسود - مرض تعفن الأثمار | Fruit rot | کەڕووە رەشە، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە. |
| مرض العفن الأخضر | | کەڕووە سەوزە، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە. |
| مرض العفن السخامي | Sooty mold | کەڕووە دوکەڵاوی ، کەڕووی هیس، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە. |
| مرض التدهور البطيء | Slow-decline | شکستی هێواش، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە. |

| | | |
|---|---|---|
| مرض انفلاق الأثمار | Fruit splitting | درزبردنی میوه ، قلیشانی میوه، نەخۆشییەکی رووەکییە. |
| مرض موت الأطراف | | مردنی لق، نەخۆشییەکی رووەکییە بە هۆی کەمی کانزای مسەوە دەبێت. |
| مرض نقص الخارصين | Zindificiency | کەمی توتیا ، نەخۆشییەکی رووەکییە. |
| مرض النقص | Deficiency disease | نەخۆشی کەمیی، هەر نەخۆشییەك لە ئەنجامی کەمیی خۆراکەوە رووبدات. |
| مرض باركنسون - شلل رعاشي | Parkinsons disease | نەخۆشی پارکنسۆن، ئیفلیجی لەرزۆکی، نەخۆشییەکە لە نیشانەکانی بێ هێزیی ماسولکەو رەق بوونو لەرزینو ئازاری ماسولکەو دەمارو راڕایی (قلق)یە. |
| مرض لوبستين | Ilbsteins disease | نەخۆشی لۆبستین، خاوبی ئێسك بە شێوەیەکی زگماکی واتە ئێسکی ئەو کەسە زوو دەشکێت. |
| مرض ثومسن | Thomsens disease | نەخۆشی ثۆمسن، بێ هێزیی ماسولکەکانی لەش لە خۆرسکییەوە. |
| مرض البقعة الحلقية | | نەخۆشی پەڵەی ئەڵقەیی، نەخۆشییەکی رووەکییە ، پەڵەی زەردی کاڵ یان ئەڵقەیی مردوو لەسەر بەشە سەوزەکانی رووەکەکە پەیدا دەبێت ئینجا پەڵەکان شەقار شەقار دەبن وەکوو تەپەدۆریان لێ دێت . ئەم نەخۆشییە بە زۆری لە سێوو هەرمێدا دەبێت. |
| مرض نيوكاسل | New Castle | نەخۆشی(نیوکاسل).نەخۆشییەکی درمی ترسناکە تووشی مریشگ دەبێت نیشانەکانی لە چاوە قوولێی مریشك (دەردەمریشك) دەچێت. |
| مرض تثقيب الأوراق | | نەخۆشی کوون بوونی گەڵا، نەخۆشییەکی رووەکییە، پەڵە لەسەر گەڵای رووەکەکە پەیدا دەبێت بەهۆی باکتریاو کەڕووەوە وەکوو لە گێلاسو قۆخو قەیسیدا. |
| مرض التفحم - سوادية | Usiilago = grain smuts | رەش هەڵگەڕان، کوورك، خەڵوزە، نەخۆشییەکی رووەکییە توێپەڵێکی رەش لەسەر لەشی رووەکەکە پەیدا دەبێت لە دواییدا توێپەڵەکە دەبێت بە تۆزێکی رەشو لە هەوادا بڵاو دەبێتەوە. |
| مرض الرصع | Foul brood | نەخۆشییەکی میکرۆبییە لە میتۆلکەی (یرقە) ی هەنگ دەداتو بۆگەنی دەکات. |
| مرض سار | Infectious | نەخۆشی درم. |
| مرض العفونة - عفن اشهب | Grey-rot = mildew | نەخۆشی بۆگەنی یان رزین، بەهۆی کەڕوویەکی میکرۆسکۆبی یەوە دەبێت لە مێوو پەتاتەو کاڵەکو پیاز . دا. |
| مرض الفيلاريا - داء الخيطيات | Filariasis | نەخۆشی فیلاریا، کرمێکی لوولەیی دەزوولەییە درێژە بە شێوەی مشەخۆر لە خوێنی یان شانەکانی لەشی گیاندارە شیردەرەکاندا دەژی بەهۆی گەستنی مێرووەوە بڵاو دەبێتەوە. |
| مرض النغف | Hypodermosis = botfly in festation | نەخۆشی مێش ئاژەڵ،میتولکەی مێشکە دەچێتە پێستی ئاژەڵەوە دوومەڵی بچووکی رەقی تیادا پەیدا دەکات. |
| مرض الذبول | Pythinmrhiz oetonia wilt = Canker = stem canker = damping disease | سیس بوون، نەخۆشییەکی رووەکییە رووەکەکە سستو سیس دەبێت بە هۆی نەبوونی ئاوو شێ لە زەویدا یان بە هۆی ئاو دەردانی (ئارەق دەردانی) زۆرەوە وەکو لە گەنمەشامیدا. |
| مرض دبول البادرات | Damping off | چەکەرە سیسە، نەخۆشییەکی رووەکییە بە هۆی کەڕو وەوە دەبێت. |
| مرض الصفراء | Biliousness | زەردوویی.نەخۆشییەکە. |
| مرض النوزيما | | نەخۆشی نۆزیما، نەخۆشییەکە تووشی هەنگ دەبێت. |
| مرض الببرين | | نەخۆشی بەبرین، نەخۆشییەکە تووشی کرمی ئاوریشم دەبێت. |
| مرض الأكياس الهوائية | Air sac disease = chronicrespiratory disease | نەخۆشی تورەکەی هەوایی، نەخۆشییەکە لە باڵندەدا دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| مرض الخريزات | Coccidiosis | نەخۆشی کۆسیدیۆسیس، نەخۆشی‌یەکە تووشی کەروێشک و باڵندەی ماڵی دەبێت. |
| مرض الخضرة | Verdigris | نەخۆشی‌یەکە تووشی گەنمەشامی دەبێت، بەهۆی کەڕوویەکی مەیلەو سەوزەوە. |
| مرض الدابرة | Ergot = clavus | نەخۆشی جقە، نەخۆشی‌یەکە دەدات لە دەغڵ و دان وەکوو: گەنم و پەرش، گوڵەکەی دەکات بە تۆپەڵێکی ڕەش لە جقەی کەڵەشێر دەچێت. |
| مرض الدمل | Furunculosis | نەخۆشی دومەڵ، نەخۆشی‌یەکە تووشی ریخۆڵەی ماسی دەبێت برین لەسەر پێستەکەی دروست دەکات. |
| مرض دودة الأمعاء | Helmin thiasis | نەخۆشی کرمی ریخۆڵە، نەخۆشی‌یەکە لە ئەنجامی بوونی کرمی ریخۆڵە لە مرۆڤ و گیانداردا پەیدا دەبێت. |
| مرض ولسون | Wilsons disease | نەخۆشی ویلسۆن، نەخۆشی‌یەکی زگماکی‌یە بەهۆی سوود وەرنەگرتن لە توخمی مس دەبێتە هۆی ریشاڵ بوونی جگەر و هەندێك پێشێویی ئاوزوویی نەخۆشەکە پێستی توێژ فڕێ دەدات. |
| مرض الملاحظة - دوار البحر | Sea-sickness | سەرە خولێ ی دەریا، سەرە گێژەی دەریا، نەخۆشی گێژبوونی مرۆڤ لە دەریادا. |
| مرض الخيل الأفريقي - طاعون الخيل | African horse plague = African horse-scikness | سەنگانی وڵاخ، نەخۆشی وڵاخی ئەفریقی، دەردە وڵاخی ئەفریقی، نەخۆشی‌یەکی درم و ترسناکە توشی وڵاخ دەبێت وە بە تایبەتی ئەسپ و ئێستر و کەر، وڵاخەکە چاوی سوور دەبێت و سەری دەئاوسێت و جاری وا هەیە خوێن لە چاوی یان لووتی دێت. |
| مرض حيواني | Panzootic disease | نەخۆشی گیاندار وەکوو:<br>١- جدمو ، پشتەرێژ، برینێکە لەناوشانی وڵاخ پەیدا دەبێت.<br>٢- چۆیلەمە، ئازارێکە لە سنگی وڵاخ پەیدا دەبێت.<br>٣- خروو زەك، خرووسەك.<br>٤- سلەومجە.<br>٥- شەوت.<br>٦- شەو سوتکە. |
| مرض نباتي | Epiphytic-disease | نەخۆشی ڕووەکی وەکوو:<br>١- دژوکە.<br>٢- سنگان، سندان.<br>٣- شۆکە ، شۆك.<br>٤- ژەنگ، خەڵووزە. |
| مرض التعفن | Rot | کەڕوو هەڵهێنان، نەخۆشی‌یەکی ڕووەکی‌یە. |
| مرض اللفحة(شري) | Blast | شەرا. |
| مرض اللفحة النارية | Fire-blight | گڕەی ڕووەك: فایەربلایت، نەخۆشی‌یەکی ڕووەکی‌یە. |
| مرض الكروم | | پەلەسیسە، دژوکە. |
| مرضع | Nurse = wednurse = nutrix | دایکێك شیر بدات بە منداڵەکەی. |
| مرضح - كسارة البندق والجوز | Nutcracker | گوێزشکێن، ئامرازی شکاندنی گوێز و فندق، بندق. |
| مرضوض | Bruised | کوتراو، وەکوو یەکێك پێی کوترابێت. |
| مرضعة | Milk nurse = wet nurse | دایەن. ئەو ژنەی شیر دەدات بە منداڵان. |
| مرضاع - مرضحة - جاروش | Guern = stonenand = milk | دەستاڕ. |

| | | |
|---|---|---|
| مرط | Carpet = rug | بەرە، كليم.جۆرێكە لە رايەخ ( راخەر). |
| مرط | Pluck | دەركێشان، هەڵكەندن.تووك لابردن. |
| مــرط = ســقوط الشعر | Alopecia = able pharia = ablephary | تووك وەرين. |
| مرط الجفنين | Madarosis | وەرينى برژانگى چاو. |
| مرطبات - منعشات | Soft drinks = refreshing, refreshments | ساردەمەنى، بەستەنى وەكوو دۆندرمە ، بووژێنەرەوەكان. |
| مرطاب - مقياس الرطوبة | Hygrometer | هايگرومەتر، شێ پێو، پێوەرى شێ، ئامرازێكە بۆ پێوانى رادەى شێ لە هەوادا. |
| مرطبات اوتوماتيكي | Hygrograph | شێ پێوى ئۆتۆماتيكى، دەزگايەكە بۆ تۆماركردنى گۆرانى شێى ناوهەوا، بە شێوەيەكى ئۆتۆماتيكى. |
| مرطاب حراري | Hygro thermograph | هايگرۆثێرمۆگراف، شێ گەرمى پێو، دەزگايەكە لە خۆيەوە بەردەوام پلەى گەرمى و شێى رادەيى ئەو شوێنە لەسەر نەخشەيەك تۆمار دەكات. |
| مرطابية | Hygrometry | پێوانى شێى ناو هەوا. |
| مرطـــاب ذو بصلتـــين = مرطاب جاف ورطب | Wet and dry bulbhygrometer | شێ پێوى دوو سەلك تەرو وشك. |
| مرطاب شعري | Hair hygrometer | شێ پێوى مووبى، جۆرێكە لە ئامرازى شێ پێوان. |
| مرطب | Wetting agent | تەركەر، شێ كەر. |
| مرطوب | Wet = wettish | شێ دار، ئاوەزێ، نەدار. |
| مرطبان | Jar | قاپ، بوتڵ، دۆلكە، دەبە. |
| مرعاويلا - شوك الجمال - رعي الأبل | Echinops | ووشتر خوار، كەرتەش، گيايەكى دەشتەكىيە گوڵەكەى خڕە رەنگەكەى شينە گەڵاكەى گەورەو دركاوييە. |
| مرعوف | Bleeding at The nose | لووت پڕاو، كەسێك لووتى پڕابێت. |
| مرعوب مخيف | Terribled | ترساو، زارەترەك، تۆقاو، زراوچوو. |
| مرعى - مرتـع - كلا | Pasturage = grass- land = pasture land | لەوەر، چەرە، لەوەرگا، بژوێن، پاوان، پاوەن، چايەر. |
| مرعة | Crake | كرێك، باڵندەيەكە بە قەدەر كوركورە دەبێت. |
| مرعة - مرعاوي | Porzana | پۆرزانا، باڵندەيەكى ئاوييە لە پۆر دەچێت لە كاتى باراندا دەردەكەوێت لەناو قاميشەڵاندا دەژى لەشى قاوەيى مەيلەو سەوزە هێڵى رەشى تيادايە. |
| مرعة الماء = تفلق | Water rail | باڵندەيەكى ئاوييە. |
| مرعة - شحم | Fat = Oil = Grease | چەوريى. |
| مرعز - مرعزاء | Angora | ئەنگۆرا، مەرەز، كەنگە، مووى بزن، بەرگن، تووكى بزنە مەرەز. |
| مرعز - ماعز أنقرة | Angora goat | بزنە مەرەز، بزنى ئەنقەرە. |
| مرغى - شهرمان = ابو فروة | Casarca | شارەمان، جۆرێكە لە مراوى. |
| مرغ | Wallow = welter | گەوزان، لە خۆڵدا گەوزان. |
| مرغاد | Hygrophyte | هەر ڕووەكێك لە شوێنى شيدارو زۆنگاودا برووێت. |
| مرغاة - مطفحة | Skimmer | كەوگير. |
| مرغريتا - خنكار - لؤلؤية | Margaret = marguerite | مارگريتا، گوڵە بەهارە گوڵە مروارى، بەرم بژى، گوڵە دوگمە. |

| | | |
|---|---|---|
| مرغارين | Margarine = oleo margarine | مارگارين، جۆرێکه له ڕۆنـی ڕووەکـی لەگـەڵ چیمـەنتۆ تێکـەڵ دەکرێـت و دەخرێته نێوانی خشت و بەدی بناغە و دیوارەوە دژی شێ ڕۆنی دەستکرد. |
| مرغنيت | Morganite | مۆرگانایت، بەردێکی بە نرخـە شـێوەیەکەی سـووری کاڵـە لـە (بریـل) لـە کالیفۆرنیاو مەدەغشقەر هەیە. |
| مرغني | Morgan | مۆرگان، ئەسپێکە لە ڕەچەڵەکێکی ئەمەریکی تایبەتی. |
| مرغوسة | Prolific | هەر گیاندارێکی مێ بێچوی زۆربێت. |
| مرفا = مرس | Harbour = port | لەنگەرگە، تایگە، کەشتی خانە، بەندەر، کەشتیگە، شوێنی وەستانی کەشتی. |
| مرفق | Elbow = Ancon = Cubitus = olecranan | ئانیشك، بەلەمرك. |
| مرفق الجاثي = مرفق | Herculis | هەرقل، ئانیشکی هەڵ نیشتوو، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| مرفق الثريا= جنب فرساوس | Persei = perseus | کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| مرفقية الأنابيب | | قۆڵی بۆری ، مرگ ، پارچە بۆرییەکی چەماوەیە بۆ بەستنی دوو بۆری بە یەکترییەوە. |
| مرفاع = رافعة = ونش | Crane = winch | بەرزکەرەوە، سەرخەر، کرێنە. |
| مرفاع لولبي | Jack = Jack = screw = screw Jack | جەك، بەرزکەرەوە، وەکوو جەگی ئوتومبیل. |
| مرفع | Elevator = lift | دەزگایەکی جێگیرە بۆ بەرزکردنەوەو ڕیزکردنی فەردەو سنوق و بەرمیل. |
| مرفعين = ضبع | Hyenq | کەمتیار،گیاندارێکی شیردەری درندەیە. |
| مرفق = ملحق | Attached (herewith) = enclosed | پێچراوە، پاشکۆ. |
| مجرفة | Shovel = spade | خاکەناز، بێڵ، پێ مەرە. |
| مـرق = مرقـة = حساء = شوربة | Broth = Meat extract = thin soup = gravy | شۆربا، شلە، چێشتی شلە، گۆشتاو، کالینکا، کۆپیتە. |
| مرق البصل | Soup of onion, onion soup | پیازاو. |
| مرق الحبوب | Soup of Cereals, cereals soup | قرك. |
| مرق العدس | Soup of lentils, lentils soup | نیسکێنە. |
| مرق الشلغم = مرق اللفت | Turnip soup | ترخێنە، چێشـتێکی کوردەوارییـە لـە بنـەڕەتدا، سـەلکو گـەڵای شـێلم دەشۆرێتەوەو دەجنرێت ئنجا برۆنشی تێدەکرێت و دەخرێتە کوپـەوە بـۆ ماوەیەك هەتا دەترشێت، ئنجا دەکرێت بە تۆپەڵ(سەلك)و لەبەر هەتاودا دادەنرێت هـەتا ووشـك دەبێتـەوە لـە زسـتاندا ئـەم سـەلکانە لـە ئـاودا دەخوسـێنرێت ئنجـا نـۆك و نیسـکی خـڕو کشمیشـی تـێ دەکرێـت و دەکوڵێنرێت.. |
| مرق البصل واللحم = يخنة | Ragout | یاغنی، یەخنی. |
| مرق اللحم | Stew of meat = Consomme | گۆشتاو. |
| مرق = حسكة = سفا | Beard | قەلاس، وەکوو قەلاسی بەری گەنم و جۆ. |
| مرق = سحام | Puccinia = Rust | نەخۆشییەکە تووشی ڕووەك دەبێت لە ئەنجامی کەڕوەوە. |
| مرقال | Apod | مێرووی بێ پەڵ. |
| مرقاب | Monitor | ئامرازێکە بۆ چاودێری کردنی وێنەی تەلەفزیۆنی. |
| مرقب = راصدة = مرصد | Observatory | ڕوانگە، جۆرە بینایەکی بەرزە دووربینێکی تیادایە بۆ تەماشاکردنی تەنە ئاسمانییە دوورەکان بەکاردێت وەکوو مانگ و ئەستێرەکان. |

| | | |
|---|---|---|
| مرقـــب راداري = تيودولايت راداري | Radar-theodolite | روانگەی راداری، ئامرازێکە بۆ پێوانی بایە بەرزەکان. |
| مرقبة (مقراب) الطيف الشمسي | Spectrohelioscope | دووربینی شەبەنگی خۆر. |
| مرقب (مقراب) لاسلكي | Telescope, wireless | تەلیسکۆپی لاسلکی. |
| مرقب (مقراب) انكساري - تلسكوب انكساري | Refracting telescope = refraclor | تەلیسکۆپی شکێنەرەوە. |
| مرقب كاسر - تلسكوب كاسر | Refractor telescope | تەلیسکۆپی شکێنەرەوە. |
| مرقب عاكس - تلسكوب عاكس | Reflector telescope | تەلیسکۆپی ڕەتکەرەوە. |
| مرقد - مضجع | Bed = Couch | شوێنی نوستن. |
| مرقب (مقراب) مجسم - مجسام مقرابي | Telestereo scope | تەلیستریوسکوب، جۆرە تەلیسکۆپێکە ئەستێرەکان بە شێوەیەکی تەنداریی پیشان دەدات. |
| مرقط - منقط | Spotted | پنکە، پنکە، خاڵخاڵ، پەڵە پەڵە، بەڵەک، شتێک پەڵەی ڕەش و سپی پێوەبێت. |
| مرقاق العجينة - شوبك - شيبك | Rolling pin | تیرۆک، بە تایبەتی تیرۆکی ئەستور کە هەردوو سەرەکەی باریکن. |
| مرقاة - سلم نقال - بركيزة | Step ladder | پەیژەی کۆڵەکەدار، پەیژەی پشتیوانەدار. |
| مرقاة كهربائية - مصعد كهربائي | Lift = elevator | ئەسانسیۆر، پەیژەی کارەبایی، پلیکانەی کارەبای. |
| مرقئة | Burnet | گیایەکە لە کۆمەڵەی گوڵەباخ. |
| مرقأة - ضاغطة الشرايين - ملقط دوار | Tournquet | بەستێنەری خوێنبەر. |
| مرقم - الة رقم الاعداد | Mumbering machine | ئامرازی ژمارە لێدان. |
| مرقوق - بقلاوة - معجنات - فطائر | Pastry | پاقلاوە.نیشی هەویر. |
| مرقان | Hypochondria | واسواسی نەخۆشی، مەراقی نەخۆشی. |
| مرقد - منوم | Hypnic = somni ferous | خەوێنەر. |
| مرقاق - مرقعة | Grain Croshing | تیرۆک.دارێکە نانی پێ دەکرێتەوە. |
| مرقشيتا - بايريت | Pyrites | پایریت، فیرۆزسولفاید، گۆگردیدی ئاسنۆز، مادەیەکە ڕەنگەکەی زەردە. |
| مرقص | Dancing hall | شوێنی سەماو سوڕدان، تیاترۆخانە. |
| مرقع - رقاع - اسكافي | Shoe maker | پینەچی، ئەسکافی. |
| مرقع | Patched | پینەکراو. |
| مرقم - قلم باستيل | Pastel | قەڵەمی باستیل، جۆرە قەڵەمێکە بە شێوەی کلۆی دەباشیر، لە بۆیە دروست کراوە بۆ ڕەنگ کردنی وێنە لەسەر کاغەزی زبر. |
| مرقي عشري - مقيا س عشري | Decimal scale | ڕژنەی دەیی. |
| مرقم ذنبي | Urostyle | یوروستیل ئێسکێکی درێژی تیژە لە کۆتایی بڕبڕەی پشتی بۆقدا. |
| مركب نفسي - عقدة نفسية | Complex | گرێی دەروونی. |
| مركب الكترا - عقدة الكترا | Electra Complex | گرێی ئەلیکترا، ئەوەیە کە کچ ئارەزووی باوکی بکات لە لایەنی ڕەگەزییەوە. |
| مركب العظمة - داء العظمة | Superiority Complex | هەست بە مەزنی کردن ، گرێی مەزنی. |

| | | |
|---|---|---|
| مركب القصور - مركب النقص - شعور بالنقص - تصاغر | Inferiority Complex | هەست بە کەمی، گرێی هەست کردن بەکەمی خۆ بەکەم دانان، گرێی کەمینتی. |
| مركب - مركبة | Constituent = Component | پێك هێنەر. |
| مركب | Compound = Composed = Complex | پێك هاتوو، ئاوێتە، مادەیەکە لە ئەنجامی یەك گرتنی دوو مادەی(یان زیاتر) کیمیایی پەیدا دەبێت لە رەوشتدا لە مادە پێکهێنەرەکانی ناچێت وەکوو ئاوێتەی ئاو کە لە یەك گرتنی هایدرۆجین و ئۆکسجین پەیدا دەبێت. |
| مركب تناسقي | Coordination Compound = Complex Compound | ئاوێتە هاوپلەیی ، ئاوێتەی تانپۆیی، ئاوێتەی ئاڵۆز، ئەو ئاوێتەیەی کە لە ئەنجامی یەکگرتنی ئایۆنێکی کانزایی (بەزۆری کانزای گواستراوە)و ئایۆنێکی ناکانزایی یان گەردیك یان کارکەرێکی ئاڵۆز پەیدا دەبێت، کارکەرە ئاڵۆزەکەیان سالیب یان موجەب دەبێت. |
| مركب سلسلي | Chain Compound | ئاوێتەی زنجیرەیی ، ئەو ئاوێتەیەی کە لە چەند گەردیلەیەك کاربۆن پێکهاتووەو پێکەوە، بە شێوەی زنجیرێك بەستراوە. |
| مركب سلسلي متفرع | Branched chain compound | ئاوێتەی زنجیرەیی لقدار،ئاوێتەیەکی زنجیرەییە، زنجیرەکەی بووە بە دوو لق یان زیاترەوە. |
| مركب ماص للحرارة | Endothermic Compound | ئاوێتەی گەرمی مژ. |
| مركب طارد للحرارة | Exothermic compound | ئاوێتەی گەرمی دەر. |
| مركب وسيط | Intermediate | ئاوێتەی ناوەندی، ئاوێتەی ناوەنجی، بەرهەمێکی کیمیاییە هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی دروست کردنی دوا بەرهەم دەنوێنێت. |
| مركب ايوني | Ionic Compound | ئاوێتەی ئایونی. |
| مركب تساهمي | Covalent Compound | ئاوێتەی هاوبەشی، ئاوێتەیەکە ئەتۆمەکانی پێکەوە بەستراون بۆ پێکهێنانی مولیکیول (گەرد) بەهاو بەشی کردن لە جووتە ئەلیکترۆندا، وەکوو لە هەزارەها ئاوێتەی ئەندامیدا. |
| مركب معقد | Complex Compound | ئاوێتەی ئاڵۆز، وەکوو کلۆریدی زیوی ئامۆنیا. |
| مركب عضوي | Organic Compound | ئاوێتەی ئەندامی، ئەو ئاوێتەی کە توخمی کاربۆن بنچینەیەکی سەرەکییە تیایدا ، لەگەڵ هایدرۆجین، یان هایدرۆجین و ئۆکسجین و نایترۆجین و فۆسفۆر هتد، وەکوو هایدرۆکاربۆنەکان و کاربۆ هێدراتەکان و رۆنەکان و پرۆتینەکان و هتد جاران بڕوا وابوو کە سەرچاوەی ئەم جۆرە ئاوێتانە لە مادەی ئەندامدار واتە لە گیاندارو رووەکەوەیە، هەتا لەم دواییدا، هەندێك لەو مادانە لە تاقیگەدا دروست کران، ئەتۆمەکانی ئاوێتەی ئەندامی بە بەند هاوبەش بەستراون بە یەکەوە. |
| مركب عضوي فلزي | Organometallic Compound | ئاوێتەی ئەندامی کانزایی، هەر ئاوێتەیەکی ئەندامی بەندی کانزای کاربۆنی تیادا بێت، وەکوو هالیدە ئەندامییەکانی مەگنیسیۆم و ئاوێتە ئەندامییەکانی سلیکۆن و ئەلکیلی کانزاکان. |
| مركب غير عضوي | Inorganic Compound | ئاوێتەی نائۆرگانی، ئاوێتەی نائەندامی ، زۆربەی ئەم ئاوێتانە بنەرەتێکی مەعدەنییان هەیە، ئەتۆمەکانیان بە بەندی هاوهێزی کارەبایی (اصره تکافؤ کهربائیة)بەستراون بە یەکترییەوە، ئەمانەش بریتین لە هەموو ئاوێتەکان (جگە لە ئاوێتە ئەندامییەکان زۆربەیان لە ئاودا دەتوێنەوەو بە گەرم کردن هەڵناوەشێن و خێرا کارلێك لەگەڵ یەکتریدا دەکەن لە شێوەیەکی ئایونیدا هەن . وەکوو ترشی هایدۆکلۆریە . تفتی هایدرۆکسیدی سۆدیۆم و خوێی کلۆریدی سۆدیۆم |

| | | |
|---|---|---|
| مركب قطبي = مركب ئايوني | Polar compund | ئاوێتەی پۆل، ئەو ئاوێتەیە کە ئەگەر شل بکرێتەوە یان لە ئاودا بتوێنرێتەوە کارەبا دەگەیەنێت وەکوو خوێی چێشت. |
| مركب ثلاثي | Triple compound | ئاوێتەی سیانی، ئەو ئاوێتەیەی کە لە سێ توخم پێك هاتووە. |
| مركب ثنائي | Binary Compound | ئاوێتەی دوانی، ئاوێتەیەك تەنها لە دوو توخم پێك هاتبێت وەکوو خوێی چێشت. |
| مركبات حلقية | Cyclic compound = ring compound | ئاوێتە ئەلقەیی‌یەکان، ئەو ئاوێتەیەی کە گەردیلەی توخمەکان لە گەردەکەیدا بە شێوەی ئەلقە ریز بووبن، (ئاوێتە ئەندامی‌یە زنجیرە داخراوەکان، ئەو ئاوێتەیەی کە گەردەکەی لە (٤) ئەتۆم یان زیاتر پێك هاتبێت وەکوو(بەنزۆل). |
| مركبات لا حلقية | Acyclic Compounds | ئاوێتە نا ئەلقەیی‌یەکان ، ئەو ئاوێتانەی کە شێوگی پێکهاتنیان وەکوو زنجیر وایە و ئەلقەیان تیادا نی‌یە. |
| مركبات كيمياوية | Chemicals | ئاوێتە کیمیایی‌یەکان. |
| مركبات كربو حلقية | Carbo Cyclic Compounds | ئاوێتەی کاربۆ ئەلقەیی. |
| مركبات اليفاتيكية - مركبات دهنية | Aliphatic Compounds | ئاوێتە ئەلیفاتیکی‌یەکان چەوری و مۆم، زنجیرە ئاوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنی‌یە، هەر ئاوێتەیەکی بە شێوەی زنجیرەیەکی کراوەیە. |
| مركبات اروماتيكية - مركبات عطرية | Aromatic Compounds | ئاوێتە رۆماتیکی‌یەکان، بۆنی خۆش، زنجیرە ئاوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنی‌یە هەر ئاوێتەیەك بە شێوەی زنجیرەیەکی ئەلقەیی داخراوە. |
| مركبات مستقيمة السلسلة | Straight chain Compounds | ئاوێتە زنجیرە راستەکان، چەند ئاوێتەیەکی ئەندامەکانیان گەردەکانیان چوار ئەتۆم یان زیاتریان تیادایە بە شێوەی هێڵێکی راست بەستراون بە یەکەوە. |
| مركب الأسنان | Dentist | دانساز. |
| مركبة - عربة | Carriage = Vechile | گالیسکە، عەرەبانە. |
| مركبة الجليد | Sledge = slede | گالیسکەی سەهۆڵ، ئەو گالیسکە بەسەر سەهۆڵدا دەخشێنرێت. |
| مركبة جياد - عربة جياد | Victoria | گالیسکە ئەسپ، عەرەبانەی ئەسپ. |
| مركب | Argus | جۆرە ئەستێرەیەکە. |
| مركب سفينة | Ship = boat | کەشتی، گەمی، ماتۆری ئاوی. |
| مركب صغير | Skipper | کەشتی‌یەکی بچووك. |
| مركب بخاري | Steam boat = steam ship | کەشتی هەڵمی، ئەو کەشتی‌یەی کە بەهێزی هەڵم ئیش دەکات. |
| مركب شراعي | Sail boat | کەشتی چارۆکەدار. |
| مركبة الأعماق | Bathys Caphe | کەشتی ناخ، کەشتی قوڵایی، کەشتی‌یەکە تیشکێکی زۆر بەهێز دەگرێتە بنکی دەریا بۆ بینینی ناخەکەی لە دووری‌یەکی زۆرەوە. |
| مركبة فضائية | Space craft = spaceship | کەشتی ئاسمانی، کەشتی بۆشایی، کەشتی‌یەکی بە شۆفێر یان بێ شۆفێر دەنێررێتە خولگەی زەوی یان دەنێررێتە دەرەوەی کەشی زەوی‌یەوە بۆ مەبەستی زانستی. |
| مركبة قمرية | Module, lunar craft | کەشتی مانگ. |
| مركبة صاروخية | Rocket ship | کەشتی رۆکێتی ، کەشتی مووشەکی، کەشتی‌یەکە بەهێزی رۆکێت دەبرێت بە رێگاوە توانای ئەوەی هەیە کە لە هەوای دەوروپشتی زەوی بچێتە دەرەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| مركم (كهربائي) | Storage battery = Accumulator | پاتری کارەبایی، پاتری کۆکردنەوە ( هەڵگرتن). |
| مركم - مركم رصاصي | Lead Accumulator = storagecell orbattery | پاتری ئۆتۆمۆبێل، پاتری تەڕ، لە پاتریەکی کارەبایی‌یە لە پێشدا بە کارەبا بارگە دەکرێت‌و کارلێك کردنێکی کارەبایی تیا ڕوودەدات، ئینجا ئەم کارلێك کردنە پێچەوانە دەبێتەوەو تەوژمێکی کارەبایی لێ پەیدا دەبێت‌و سوودی لێ وەردەگیرێت. |
| مركوني | Marconi | مارکۆنی، پەیوەندی بە بروسکە لێدانی بێ تەلیوەوە هەیە کە زانا مارکۆنی دایهێناوە. |
| مركن - طشت الغسيل | Washing pan = wash tub | تەشتی جل شتن. |
| مركن - سندانة | Pot | ئینجانە ، ئینجانەی گوڵ. |
| مركن - مطار | Aerodrome | فڕۆکەخانە. |
| مركروكروم | Mercuro chrome | مێرکرۆکرۆم، تۆزێکە لە ئاودا شی دەبێتەوەو شلەیەکی سووری لێ پەیدا دەبێت بۆ کوشتنی میکرۆب بەکاردێت واتە بۆ تیمارکردنی برین. |
| مركز | Concentrated | تونگ، پەیتکراوە، پەیت، توند،خەست،سەنگین، تیر. |
| مركاز | Dosimeter | دەزگای پێوانی پەیتی(ترکین). |
| مركز | Center = Centre = Middlepoint | چەق، ناوچەق، ناوەڕاست، مەڵبەند، کورتە، ناوجەرگە، جەرگە، بنکە، نیڤك. |
| مركز الدائرة | Center of the Circle | کورتە، چەقی بازنە، کورەکی بازنە، جەرگەی بازنە. |
| مركز - منزلة - مقام | Standing | پایە، مەقان. |
| مركز البوليس - ضبطية | Police station | زەفتیە، مەڵبەندی پۆلیس، پۆلیسخانە. |
| مركز المراقبة | Watch tower | چەقی چاودێری، جەرگەی چاودێری، شوێنی چاودێری، چاودێرگە. |
| مركز التكور | Center of Curvature | چەقی خڕی، جەرگەی خڕبوون، ناوەڕاستی خڕی، ناوەڕاستی خڕبوون، خڕبیگە. |
| مركز الثقل | Centre of gravity | چەقی قورسایی، جەرگەی قورسایی، ناوەڕاستی قورسایی، قورساییگە، ئەو خاڵەیە لە تەندا وا ڕەچاو دەکرێت کە هەموو قورسای ئەو تەنەی تیادا کۆبووبێتەوە. |
| مركز الكتلة | Mass center | چەقی بارستە. |
| مركز باطني للزلازل | Hypocenter | چەقی ناوەکی بوو مەلەرزە. |
| مركز التماثل - التناظر | Center of symmetry | چەقی هاوتایی، چەقی لێك چوون. |
| مركز العزوم | Center of moments | |
| مركز عصبي | Nervous center | چەقی دەماری. |
| مركز الذوق | Taste center | چەقی چێژتن. |
| مركز سمعي | Auditory center | چەقی بیستن. |
| مركز هندسي | Geometrical center | چەقی ئەندازەیی. |
| مركز الطيف | Spectral center | چەقی شەبەنگ. |
| مركزي | Central | چەقی، هەرشتێك پەیوەندی بە چەقەوە هەبێت. |
| مركزية | Centrality | چەقێتی. |
| مركوب - حذاء | Shoes = boots | پێڵاو. |
| مركبتان | Mercaptan | مێرکاپتان، ناوێتەیەکی کیمیایی‌یە. |

| | | |
|---|---|---|
| مركيز | Marchese = marquis | ماركيز، نازناوێکی سەروەرییە (بۆ پیاو). |
| مركيزة | Marquise = marchesa | مارکیزە، ژنی مارکیز، نازناوێکی سەروەرییە(بۆژن). |
| مركيزيت | Marquisette | مارکیزیت، قوماشێکی تەنکە. |
| مركزيت | Marcasite | مارکازایت، جۆرێکە لە مەعدەن. |
| مرل - مارن | Marl = marne | مارل، مارن، قوڕێکی لماوییە ڕێژەیەکی زۆری لە کاربۆناتی کالسیۆم تیادایە. |
| مرلي - مرني | Marly | هەرشتێك پەیوەندی بە قوڕی (مارل) وە هەبێت. |
| مرلين | Marline | مارلین، ماسییەکی زەریایی گەورەیە. |
| مرليت | Marlite | مارلایت، جۆرێکە لە قوڕ، کاربۆناتی کالیسیومی زۆر تیادایە. |
| مرلون | Merlon | مێرلۆن، دیوارێك لە نێوان دوو کوندا وەکوو لەناو قەڵاکاندا دروست دەکرێت. |
| مرما حوز - مرو | Amaracus | ریحانە شێخانە.جۆرە گیایەکە. |
| مرماخور - طوقريون - صعتر الهر | Marum germander = cat Thyme | جاترەی پشیلە، ڕووەکێکی بۆن خۆشە دەرمانی بەهێزکەری دەمارو کۆڵنجی لێ دەردەهێنرێت. |
| مرمة، شفة متدلية | Lip (pendulous) | لچ، لچی شۆڕ، وەکوو لچی مانگا. |
| مرمطون - مساعد الطباخ | Scullion | یاریدەدەری چێشتکەر. |
| مرمبة | Marimba | ماریمبا، ئامرازێکی مۆسیقایە لە بنەڕەتدا ئەفریقییە. |
| مرموط - فار الجبل | Marmot = Monax = Bobac = arctomys | مشکی چیایی، مارمۆت، مشکە کێوی، گیاندارێکی شیرەدەری قرتێنەری کلك کورتە ڕووەکخۆر دلەنوێڵە دەخەوێت لە زستاندا لە کونو کە لەبەری ژێر زەویدا خۆی مت دەکات سەری پانە ڕەنگەکەی قاوەیی مەیلەو زەردە، لە جرج گەورەترە. |
| مرموط الألب | Rock whistler | مشکی چیای ئەلپ ، جۆرێکە لە مارمۆت گیاندارێکی قرتێنەرە لە کۆمەڵەی سمۆرە لە مشك گەورەترە سەر زل و کلك کورتە. |
| مرموط امريكا | Ground hog | مشکی چیای ئەمریکا. |
| مرمى - مدى الرمي | Range = reach | نیشانە، مەودای هاویشتن. |
| مرمر - بستر - رخام | Marble = Alabaster | مەڕ مەڕ، خارا، جۆرێکی ڕەنگاو ڕەنگی بە نرخە لە بەردی قسل یان گۆگرداتی کالسیۆم خانووی لێ دروست دەکرێت بە ئاسانی ڕەنگ دەکرێت لەبەر ئەوە بۆ دیکۆری خانو بەکاردێت. |
| مرمري - رخامي | Marbled = marmoral | مەڕمەڕی، شتێك پەیوەندی بەمەڕمەڕەوە هەبێت. |
| مرمريج | | بگەرێرەوە بۆ (مارماهی). |
| مرميس - كركدن - مريش - هرميس | Rhinoceros | کەرکەدەن، یەك شاخە.(گیاندارێکەی کەتەی دڕندەیە). |
| مرملة | Sand box | قوتوی لم. |
| مرمير - مرمار - حفار | Mormyrus | مۆرمێرەس، جۆرە ماسییەکە ڕەنگەکەی زیوییە لە کەناری دەریاکانی سوریادا دەژی. |
| مرملة | Gravel-pit = sand-pit | کانەلم، کانەچەو. |
| مرمد | Incinerator | تونێکی (ئاگردانێکی) تایبەتییە بۆ سوتاندنی مادەو گۆرپیسی بۆ خۆڵەمێش. |
| مرموزة - هبال | Marmoset | مارمۆسیت، جۆرە مەیمونێکە لە وورچ دەچێت. |
| مرموزة - دمشقية - حافرية | Slipper wort | گیایەکی دەشتەکییە قەدەکەی توکنە گوڵەکەی شێوەیەکی سەیری هەیە لە سۆڵ (پێڵاو) دەچێت بە ڕەنگی سپی یان سور. |

| | | |
|---|---|---|
| مرملاد | Marmalade | مارمالاد، جۆره خواردەمەنی‌یەکەلـه مرەبا دەچێت لـه تێکـەڵاوی شـەکرو پارچه میوه یان ئاوی میوەو تونکلّی میوه دروست دەکرێت. |
| مرميكوديا | My rmecodia | میرمیکودیا، رووەکێکی ناوچه گەرمەکانه مێرووله شار لـه ناو قەدەکـەی‌دا دروست دەکات. |
| مرنان | Resonator | لـەره پەیداکـەر، دەزگایەکـه، بـۆ پـەیداکردنی کـەره،دروسـتکراوه وەکـوو دەزگای ماگنیترۆن. |
| مرنغ | Meringue | مێرینگویی، تێکەڵاوێکه له شەکرو سپێنەی هێلکه دەدرێت لـه حەلْوا، یـان کێکێکی بچووکه لەم تێکەڵاوه دروست دەکرێت. |
| مرنج | | مورونچـه، درەختێکـه دەنکەکـەی زۆر رەش‌و بـۆن خۆشـه دەکرێـت بـه تەزبیح‌و ملوانکه بۆ یاری کردن. |
| مرنطة = اروتة | Maranta = Arrow-root = plant | ئـارۆروت،رووەکێکـی سـەلك داری دەسـتەکی‌و کشـتوکاڵی‌یه لـه کۆمەڵـەی زەنجەفیل‌و گەڵاکـەی گـەورەو گوڵەکـەی، بـه شـێوەی هێشـوویی سـپی‌یه، مادەیەکی نیشاستەیی له سەلکەکەی دەردەهێنرێت پێی دەوترێت (ئاڕوو رووت) بۆ مەبەستی خواردەمەنی بەکار دەهێنرێت. |
| مرن | Elastic = Flexible | جیڕ، نەرم، خاراو. |
| مرنبة | Hutch = warren | کولانەی ( هێلانەی) کەروێشك. |
| مرهم - دهان | Oint ment = salve = Vnction = pomade = unguent = liniment | مەڵحەم،چرك، مەرهەم، هەتوان. |
| مرهم العين | Oculencem | مەڵحەمی چاو. |
| مرحم عطري | Pomade | مەڵحەمی عەتریی، مەڵحەمی بۆنخۆش. |
| مرهم الترادیل | Ultradil ointment | مەڵحـەمی ئـەلترادیل، جۆرێکـه لـه مەلحـەم بـۆ چارەکردنی نەخۆشـی پێست.. |
| مرهم تتراسايكلين | Tetra cycline oint ment | مەڵحەمی تیتراسایکلین، مەڵحەمێکه بۆ چارەیەکردنی نەخۆشی پێست. |
| مرهم دیرموكیور | Dermocure | مەڵحەمی دێرمۆکیور، مەڵحەمێکه بۆ چارەکردنی نەخۆشی پێست. |
| مرهم الحروق | Burn Cream | کرێمـی سـوتاویی، مەڵحـەمی سـوتاویی، دەرمـانێکی پـاکژ کـەرەوەو ئارامدەرە. |
| مرهن - بنك الرهون | Pawshop = paw broker | بانقی رەون، بانقی بارمته، بانقی رەهن کردن. |
| مرهوانة = قنب هندي | Marihua | گوشـی هیندی، ماریوانا، گەڵاو گوڵـه وشك کراوەکانی وەکوو مادەی بـێ هۆش کەر بەکاردەهێنرێت. |
| مرهوب | Frightened | ترساو،تۆقاو، زارەترەك، زراو چوو. |
| موهون = مرتهن | Mortgaged | رەهن کراو، به بارمته دانراو. |
| مرهق = متعب | Tired | ماندوو. |
| مرهاء = مقياس الأرتفاع | hypsometer | دەزگایەکه بۆ دەست نیشان کردنی بەرزایی شوێنێك یان شتێك. |
| مرهة | A.pond = Artificial meter | زەلکاوی دەستکرد بۆ کۆکردنەوەی ئاوی زستان، ئەستێل. |
| مرو | | درەختێکـی بـەرزو پانـه سـێبەری زۆره بەرەکـەی لـه زەیتـون دەچێـت دەخورێت. |
| مـرو - حبـق الشـيوخ - خرنبـاش = مرمـاحوز - زنمتر | Amaracus Maru, orig anum maru | رەیحانه شێخانه، جاتره، دەومەنێکی دەشتەکی یان کشتوکاڵی بۆن خۆشه گوڵەکەی پەمبەیی‌یه، به بەهارات دەژمێررێت دەرمانی بەهێزکردنی گەدەو باکردنی لێ دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| مرو = مروة = بلور صخري - حجر الصوان - كوارتز | Flint = Quartz | كوارتـز، بـەردە ئەسـتێ، بریتییـە لـە مـادەی سـلیكا (دووەم ئۆكسـیدی سلیكۆن)، پتەوییەكـەی (٧)و كێشـی جۆرییەكـەی ٢/٦٥ غـم/ سـم [٣]، كوارتزی پاك بێ رەنگە پێی دەوترێت بلووری كەڤرینی، ئەگەر بنەوشەی بێت واتە خڵتەی مەنگەنیزی تیادابێت ،پێی دەوترێت (جەمشت) یان (یاقوت جمری)، ئەگەر زەرد بێت پێی دەوترێت زمرووتە درۆزنە، ئەگەر قاوەیی بێت پێی دەوترێت كوارتزی دوكەڵاوی. |
| مرووردي | Rose Quartz | كوارتـزی پەمبـەیی، بـەردێكی بـە نرخـە جۆرێكـە لـە كوارتزرەنگەكـەی پەمبەییە بە بوونی كەمێك لە كانزای تیتانیۆم. |
| مرونة | Elasticity = Flexibility = plasticity | جیری، نەرمی، خاراوی، گەڕانەوەی تەنێك بۆ دۆخی جارانی خۆی، (ئەگەر پەستانی لەسەر لابرا) |
| مروض - سائس | Tamer = trainer | بەخێوكەر، پەروەردەكەر،سەیز. |
| مروض الخيل | Horse-tamer = horse = breaker | مەیتەر، سەیز. (بەخێوكەری وڵاغ). |
| مروض الأسود | Horse tamer, horse brealcer | شێرەوان. |
| مروض الفيلة | | فیلەوان. ئەوەی فیل بەخێو دەكات. |
| مروض القرود | MonkeyTrainer | لۆتی، مەیمونەوان. |
| مروض الأفاعي - حاوي الحيات | Snake charmer | مارگر، ئەوكەسەی كە یاری بە مار دەكات. |
| مروض الباز - مروض الصقور | Falconer | بازدار، بازەوان، ئەو كەسەی كە باز بەخێو دەكات یان مەشقی پێ دەكات. |
| مروض الكلاب | Dog trainer | سەگەوان، ئەو كەسەی سەگ بە خێوی دەكات. |
| مروق - مصفي | Clarifier | روونكەرەوە. ئەو مادەیەی كە خڵتە لە ئاو یان شلەكانی تر دەنیشێنێت. |
| مروخ - لوك = دهان | Linim = Embrocation = Ointment | هەنوەر، دەرمانی هەنوون، پێ چەوركردن، مادەیەك كە بۆ چەوركردن و شێلانی لەش بەكار بهێنرێت. |
| مروحة | Fan = shaped | باوەشێن، جۆرێكە لە جۆرەكانی هەڵپاچینی درەخت. |
| مروحة - مهواة | Fan | باوەشێن. بۆ خۆ فێنك كردنەوە. |
| مروحة | Fan = propellar | باوەشێن، پەروانە، باژەن. |
| مروحة الطائرة و الباخرة - داسر | Propeller | پەروانە، پەروانەی فڕۆكەو كەشتی. |
| مروحة المنضدة | Punke | پانكەی سەرمێز. |
| مروحةالسقف الكهربائية | Ceiling fan | پانكەی بن میچ. |
| مروحة من الخيش | Punka | پانكەیەك لە قوماش یان كەتان دروست دەكرێت لە بن میچی ژوورەوە شۆڕ دەكرێت. |
| مروحة كهربائية | Electric fan | پانكەی كارەبایی، باوەشێنی كارەبایی. |
| مروحة ساحبة الهواء | air drawer fan | پانكەی باكەش. |
| مروحة البحر | Seafan | . باوەشێنی دەریا، گیاندارێكی دەریاییە. |
| مروحي الشكل | Flabelliform = rhipidate = rhipidate | شێوە باوەشێنی |
| مرواز - بارومتر | Barometer | بارۆمەتر،پێوەری پاڵەپەستۆی هەوا، پەستان. پەستان پێ. |
| مرواز - فورتن = بارمترفرتن | Barometer = fortin | بارۆمەتری (پەستان پێو) فۆرتن،جۆرێكە لـە پەسـتان پێـوی جیوەیـی لـە پێوانی كەشدا بەكاردێت. |
| مرواز كيو | Kew barometer | پەستان پێوی كیو، جۆرێكە لە بارۆمەتری جیوەیی بە زۆری لە ئینگلتەرەدا بەكاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| مـرواز زئبقـي = بارومتر زئبقي | Mercury Barometer | بارۆمەتری جیوەیی. |
| مـرواز معدنـي = بارومتر معدني | Aneroid barometer | بارۆمەتری کانزایی ، پەستان پێوی مەعدەنی جۆرێکە لە بارۆمەتر جیوەی تیادانییە. |
| مرواز مسجل = بارومتر مسجل | Registrar barometer = Barograph | بارۆگراف، بارۆمەتری تۆمارکەر.پێوەری تۆمارکەری پاڵەپەستۆ. |
| مروع | Terrible = frightful | ترسێنەر، تۆقێنەر، ترسناك سامناك. |
| مروي = مستوي | Irrigated | زەوی ئاودێری، زەوییەك بەرنگەی ئاودێری ئاوبدرێت. |
| مرود | Shoe | پێڵاو. |
| مـــرود العـــين = وصلة متراوحة | Stylet = Axle = pivot = swive | (١) کلچیۆك، میلچیۆك.<br>(٢) تەوەرە، دووخ،ئامرازێکە بۆ لە شتی جێگیر دەکات کە بە ئاسانی بە سەریدا بسوورێتەوە.<br>(٣) زمە، بۆ پاککردنەوەی لوولەی تفەنگ. |
| مرور = عبور | Passing | تێ پەڕبوون ، گوزەرکردن، رابوردن. |
| مروس التبغ | Flea beetle | قالۆنچەکێچی ، قالۆنچەیەکی زیانبەخشە بە رووەکی تووتن. |
| مروش = رئد = فسيل = فرخ | Sprout = shoot | خەلف، براله، نەمام. |
| مروق = ديلزة | Dialysis | دەیلەزە، جیاکردنەوە بە پەردە ، جیاکردنەوەی مادە نیمچە ملەکان لە مادە تواوەکان بە بەکارهێنانی پەردە. |
| مريق = موركس = ابو دينار = صدفة صخرية | Murex | سەدەفی کەڤری، مورێکس، جۆرێکە لە گوێچکەماسی رەنگێکی ئەرخەوانی ئایابی لێ دەردەهێنرێت. |
| مريق الدماء = سفاح | Shedder of blood | خوێن رێژ. |
| مريلة = مريول | Bib | بەروانکە، دەکرێتە بەری منداڵ بۆ پاكو تەمیزیی. |
| مريع | Terrible = frightful | ترسناك، تۆقێنەر. |
| مريب | Suspect | گوماناویی. |
| مريسة | Morris | مۆریس، جۆرێکە لە سەمای ئینگلیزی. |
| مريسة = مزر | Barleywine = sudanesebeer | بیرە، بیرەی جۆ. |
| مريس = ريح الجنوب | South-wind | بای باشووریی. |
| مريح | Comfor table | قوڵا، حەوێنەرەوە. |
| مريض | Dise ased = sick = ill = patient | نەخۆش،خەستە، بیمار، ناساخ، دەردەدار. |
| مريض مزمن | Chronic | دەردەدار، نەخۆشی درێژخایەن. |
| مريق = قرطم | Carthamus = Safflower | کاژیلە، زەرتك ، کابیشە. جۆرێکە لە رووەك. |
| مرياح = مقياس الريح | Anemometer | ئەنیمۆمەتر، باپێو، پێوەری با، ئامرازێکە بۆ پێوانی رێژەو هێزو خێرایی. |
| مرياح داينز | Dinesanemomefer | باپێوی داینز، چاکترین جۆری، با پێوەکانە لە کەش زانیدا بەکاردێت. |
| مريـــاح ذو رفـــاس = مرياح ذو مروحة | Prope llor(or) wind mill | باپێوی پەروانەدار، ئاش با. |
| مرئي | Cullet = Esophagus = Oesophagus = Esophaqus | سورێنچك، ترترۆك، ئۆربەلیشك، بۆری خواردەمەنی لە گەرووەوە بۆ گەدە. |
| مريرة | Loop | ئەلقەیەك لە جەمسەری پەتدا. |

| | | |
|---|---|---|
| مريط = أمرط | Hariless = scanty haired | بێ تووك، رووتاوه. |
| مريمية = قويسة = مخزنية = قصعين = سالمة = قويسة | Sage = clary salvia | مریەمی، سالڤیا، سنج، ئەرتمیزیا، رووەکێکی ناوچە گەرمەکانە بەهۆی تۆو قەلەمەوە زیاد دەکات بۆن خۆش و بە نرخە بە شێوەی بەهارات هەروەها بۆ مەبەستی پزیشکی دژی کۆکەو سەرما بەکاردێت. |
| مريخ | Mars | مارس، بارام، بەهرام، هەسارەیەکی گەرۆکە (١٤٢) ملیۆن میل لە خۆرەوە دوورە، تیرەکەی (٤٢٥٠) میلە، سوڕەکەی بە دەوری خۆردا بە (٢٢) مانگو نیو تەواو دەبێت، گۆرەکەی سوورە، چوارەم ئەستێرەی گەرۆکە لە نزیکیدا لە خۆرەوە، نزیکەی ١٠٨ر٠ ی خڕۆکی زەوی دەبێت ، دوای ئاوابوونی خۆر لە باشووردا بە دوو سەعات هەڵ دێت پرشنگەکەی سوورە، دوو پاشکۆی هەیە فۆبۆس و دیمۆس. |
| مرير = فربيون | Spurge = euphorbia = sun-spurge | شیرمان خوژیلك، رووەکێکە،شیراوێکی تاڵی تیایە. |
| مرير | Yellow succory = endive = dandelion | تاڵیشك،گیایەکی دەشتەکی پزیشکییە قەدەکەی شیراوێکی تاڵی تیایە قەراغی گەڵاکەی دداندارەو شێن کارە، گوڵەکەی زەردە دەرمانی لێ دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی خوروو و گەڕیی وبەردی گورچیلەو میزگیران. |
| مريرة = خندويل | Chondrilla = Gum succory | رووەکێکی دەشتەکی پزیشکییە گەڵاکەی لە تاڵیشك دەچێت گوڵەکەی مەیلەو سوورە گەڵاکەی تاڵە بەڵام دخورێت قەدەکەی جەوییەك دەردەدات بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| مريا | Myrla = myriad | میریا، دە هەزار. |
| مرياغرام | Myriagram | میریاگرام،دە هەزار گرام. |
| مريا لتر | Myria liter | میریا لتر، دە هەزار لیتر. |
| ميريامتر = ميريامتر | Myriameter | میریامەتر، دەهەزار مەتر. |
| ميرياد | Myriad | میریاد دەهەزار. |
| مريوط | | گوێی وولاخ، جۆرە رووەکێکی سرکەرە. |
| مريلة = مريول | Bib | بەروانکە. |
| مريلة = ميدعة | Smithapron | بەروانکەی ئاسنگەر. |
| مريسي | South-wind | بای باشووری |
| مريراء = مرير | Star thistle | مرۆر، تاڵەکە، دووگوڵە، گیایەکە لەناو گەنمدا دەروێت دەنکەکەی رەش و تاڵە دەبێت فڕێ بدرێت ئەگینا نانەکە تاڵ دەبێت. |
| مرينة = مورين | Morina = whorl flower | دەوەنێکی رازاندنەوەیە گەڵاکەی دڕووڵەییە گوڵەکەی زەردە یان سپی یان پەمەیییە. |
| مرينو = مرينوس | Merion | مارینۆ، جۆرێکە لە مەڕی ئیسپانیایی ، یان خوری. |
| مرينة = لامبري | Lamprel = lamprey = muraena | لامپری، جۆرێکە لە مارماسی، دەمی دەنووسێنێت بە ماسی تـرەوەو خوێنەکەیان دەمژێت. |
| مرينة خشب | Beam of wood | بارەتەختە، بارەدار. |
| مريون | Morion | مۆریۆن،(١) جۆرێکە لە کوارتز رەنگەکەی تۆخە،(٢) جۆرێکە لە خودە (شەپقە). |
| مز | Acidulous = Tart | مزر، مەزەدار، مێخۆش، ترش و شیرین، کەمێك ترش. |
| مزاع = قنفذ | | راجع قنفذ. |

| | | |
|---|---|---|
| مزاد = مزايدة - مزاد علني | Bidding out = bidding | مەزات، هەراج. |
| مزادة = مزود | Knapsack = travellers provision sack | تێشووبەرە، هەمانە. |
| مزارع | Metayer = agriculturist | جوتیار، کشتکار، کشتیار. |
| مزارع الشلب | Rice field | گۆخل، جودانە، ئەو کەسەی کشتوکاڵ بەکرێ دەکات. |
| مزاح | Joking = fun | یاری، وازی، گاڵتە، گەپ، حەنەك. |
| مزاح | Desplaced | لابراو، دەرکراو، لادراو. |
| مزاج | Temperament = humor= Humour = mettle | تەبیعەت، میزاج، زاڵ، بوونی رەوشتێك بەسەر رەوشتەکانی تری مرۆڤێکدا. |
| مزاج ليمفاوي - بلغمي | Phlegmatic-temper ament = lymphatic temperament | میزاجی لیمفاویی، میزاجی بەڵغەمی، رەوشتی لیمفاوی. |
| مزاج دوري | Cyclo Thymia | میزاجی نۆرەیی، پشێوییەکی ژیرییە، لە پێشدا دەبێتە هۆی وورژان و چالاکییەکی بەتین دوای ئەوە دەبێتە دڵتەنگی خەفەت و نائومێدیی. |
| مزاج صفراوي | Choleric(bilious) temperament = biliousness | میزاجی ، زراویی، رەوشتی زراویی. |
| مزاج عصبي | Nervous temperament | میزاجی دەماریی، رەوشتی دەماریی. |
| مزاج دموي | Sanguine temperament | میزاجی خوێنیی، رەوشتی خوێنی. |
| مزاج سوداوي | Sanguine-temperament | میزاجی ماخۆلانی، رەوشتی ماخۆلانی. |
| مزايدة | Auction = bidding | زەم کردن لەسەر. |
| مزال | | پشتی سەر. |
| مزار مقدس | Chapel | قسن، گۆرستانی پیرۆز. |
| مزبدة | Butter factory | کارگەی کەرە. |
| مزبلة - مخثاة | Midden pit = dump = dung hill | سەرە نوێلك، زبڵخانە، کیفك، زابۆق، سەخورگا سەران گوێلك. |
| مزبر - معلوف - مسمن | Stalled = fattened = stallfed | دابەستە ، مەرێك دابەستراببێت بۆ قەڵەوکردن. |
| مزبدة - حشرة باصقة | Frog-hopper | مێرووییەکی نیو باڵییە بە لەشی پانە. |
| مزة | Acidulous | مەزە ترش و شیرین. |
| مزج - خلط | Mixing Blending | تێکەڵ کردن، تێکەڵاوکردن. |
| مزجة - لوزمر | Bitter almond | درەختی بادەمی تاڵ. |
| مزجم | | جۆرە درەختێکە بەرزو پانە سێبەری زۆر بەرمەکەی لە زەیتون دەچێت دەخورێت. |
| مزجج | Glazed | شوشەبەند. |
| مزحزح | Dislodge | جێ شلۆق- لەقیو.لابراو- لادراو-جێ لەق. |
| مزح - مزاح | Joking = fun | یاری، وازی، گاڵتە، گەپ. |
| مزدحم | Crowded | قەرەباڵغ، پڕ، چڕ. |
| مزدوج - مزدوجة | Couple = Binary = Geminate = Gemina = Double = Didymous | دووانە، جووت، جووتانە، دوو هێزی یەکسانی (متساوی) هاوتەریبی پێچەوانە لە ڕێڕەودا. |

| | | |
|---|---|---|
| مكمة | Rideg plough | جۆرێکە لە گاسن (محراث) |
| مكن = صئبان | Eggs of insects | رشك، گەرای مێروو. |
| مكنسة | Broom | گەسك، گسك، چاڕو، گزگ. |
| مكنسة من عيدان | Broom made from branches | قاروشە، گرك. |
| مكنوز | Treasured up | سامانی هەڵگیراو، سامانی شاراوە، یان عەمارکراو. |
| مكنوس | Swept | ماڵراو. |
| مكنسة الجنة - كوشية | Kochia | کۆشیا، رووەکێکی گیاییە بۆ رازاندنەوە بەکاردێت. |
| مكنسة العفريت = مكنسة الساحرة | Witches broom = hexenbesen | گەسکی دێو، نەخۆشییەکی رووەکییە گرێی نائاسایی لەسەر پەیدا دەبێت لە فلچە دەچێت. |
| مكنسة كهربائية | Vacuum Cleaner | گەسکی کارەبا. |
| مكنانة = مدرة | Goats rue | گیایەکە گوڵەکەی بە شێوەی هێشوویی شین یان بنەوشەییە گەڵاکەی وەك پەڕ وایە، بۆ لەوەڕ باشە هەندێکی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| مكنترون - مغنطرون | Magnetron | ماگنیترۆن، زمانەیەکی (صمام) بەتاڵ کراوەیە، دەریەڕینی ئەلیکترۆنەکان تیایدا لەژێر کاری کایەیەکی موگناتیسی دەرمکییدایە. |
| مكنة (ماكنة) ومزهرست | Wimshurst machine | مەکینەی ویمزهرست. |
| مكنة درفلة | Rolling mill | مەکینەی گونجاندنی کانزا، هەویری کانزاکان دەخرێتە نێوان لوولەی خولاوەوە بەمە پلێتو شیشو تۆپو بۆڕیو شریتیان لێ دروست دەکرێت. |
| مكنوع = مقطوع اليد | | دەست بڕاو،کۆڵ، گۆج. |
| مكنس = ذرة المكانس | Sorgho | گەنمەشامی گسك. |
| مكننة | Mechanisation | ماکینە کردن، ماکینێن، مەکینانەن، کردنی شتێك بە میکانیکی. |
| مكهار = مقياس الكهرباء | Electrometer | ئەلیکترۆمەتر، ئامرازێکە بۆ پێوانی بڕی هێزی کارەبا، یان بۆ دۆزینەوەی بوونی کارەبا. |
| مكواة - مكواي الملابس | Flat iron | ئوتو. |
| مكواة السمكري | Soldering | ئوتوی تەنەکەچی، ئوتوی لەحیم، ئامرازێکە تەنەکەچی بۆ مەبەستی لەحیم کردن بەکاری دەهێنێت. |
| مكواة بخارية - مكواة اسطوانية | Flat iron | ئوتوی هەڵم. |
| مكواة الجراح - مكواة الطبيب | Cautery | ئوتوی پزیشکی. |
| مكواة الشعر | Crimping iron | ئوتوی قژ، ئامرازێکە بۆ قژ لوول کردن. |
| مكواة اسطوانية | Mangle | ئوتووی لوولەیی، ئامرازێکە بۆ ئوتوکردنی جل و بەرگ، بە تێپەڕکردنی جل و بەرگە کە بەناو دوو لوولەی گەرمدا. |
| مكواة كهربائية | Electro caulery | ئوتوی کارەبایی،داخکەری کارەبایی. |
| مكواة = ميسم | Cauter | داخکەر،ئامرازی داخکردن بۆ کوتانی لەش بەخاڵ و میل. |
| مكوى = مكوجي | Ironer | ئوتوچی. |
| مكوك = موم | Shuttle | مەکۆ، شەپۆپە، ئامرازی چنین، پارچەیەکە لە پارچەکانی مەکینەی درومان هەمیشە دێت و دەچێت لەکاتی درووماندا. |
| مكوك الفضاء | Space shuttle | مەکۆی بۆشایی. |
| مكون | Component = ingredient = Constituent | پێکهێنەر. |

| | | |
|---|---|---|
| مكونات المرجان | Madreporaria | مادریپۆراریا، شیلان پێکهێنەر، کۆمەڵە گیاندارێکن شیلان (کۆراڵ) پێك دەهێنن. |
| مكور - مكورة | Coccus = Cocci | خانەیەکی خڕ، باکتریای خڕ. |
| مكو عقدي - مكور سبحي | Streptococus | باکتریای تەزبیحی، جۆرە باکتریایەکی خڕە بە شێوەی زنجیرە واتە تەزبیح کۆمەڵ دەبێت وەکو میکرۆبی نەخۆشی سورکە(حمرە). |
| مكور عنقودي | Staphylo Coccus | باکتریای هێشوویی، جۆرە باکتریایەکی خڕە بەشێوەی هێشوویی، کۆمەڵ دەبێت لە کێم و دومەڵدا هەیە. |
| مكورة معوية | Entero coccus | باکتریای ریخۆڵە. |
| مكورة دقيقة | Micro Coccus | مایکرۆکۆکەس، میکرۆبێکی بچووکی خڕە. |
| مكورة = عمامة | Turban | مێزەر، سەرومێزەر، کڵاوجامانە. |
| مكوفر | Camphorated | کافوراویی، کافورکراو، هەرشتێك کافوری تێکرابێت. |
| مكوار = هراوة | Club | تۆپز، کوتەك، تۆبز. |
| مكوس | | بەردەبێزار، ئامرازێکە لە ئاسن بەرداشی پێ رێك دەخرێت لەکاتی زبربوونیدا. |
| مكوث | | راجع (مكث). |
| مكياج | Make up | ماکیاج، ئارایشت. |
| مكيال | Modulus = Drymeasure | پێوەر، پێوانە، پێ پێو. |
| مكيف | Adapted | گونجێنەر،لوێنەر، ئامرازێکە بۆ بەستنی دوو بەشی دەزگایەك بە یەکەوە یاخود بۆ گونجاندنی دەزگایەك بۆ مەبەستێکی تر. |
| مكيف - موجه تكثيف | Adapter | گونجێنەری خەست کردنەوە، بۆرییەکی شووشەیی مل باریکە دەخرێتە کۆتایی ئامرازی خەستێنەرەوە(مكثف) بۆ ئاراستەکردنی شلە دڵۆپێنراوەکە بەرەو دەفری کۆکردنەوە. |
| مكيدة | Stratgem = artifice = plot = machination | فێڵ، تەڵە، پەنگ، سەنگ. |
| مكين - راسخ - وثيق | Firm = Solid = Strong | قایم، مەحکەم. |
| ملا | Congregationk | خەڵقی، کۆمەڵ. |
| ملا - فقيه | Mullah | مەلا، ئیمامی مزگەوت. |
| ملاءة | Skirt | تەنوورە، بەشی خوارەوەی قاتە جلی ژنانە. |
| ملاءة = ملحفة | Sheet | مەوج، جۆرێکە لە پێخەف، چەرچەف، مئیل. |
| ملاءة السرير = ملاية السرير | Bedsheet | سەرجێ، چەرچەف. |
| ملائم | Suitable = Fit | شایستە، شیاو، لواو، گونجاو، لەبار، هەموار. |
| ملاءمة | Adaptation = Convenience = Fitness = Suitability | شیان، لوان، گونجان، هەمواری، گونجاوی. |
| ملاب - ملبيغيا | Barbados Cherry = malpighia | درەختێکە گەڵاکەی درکاوییە گوڵەکەی بەشێوەی هێشووی سوور یان پەمبەیی یان سوورە هەندێکی بەرەکەی وەکوو گێلاس وایە مەیلەو ترشە ئەخورێت. |
| ملابار - باز لاء بيضاء | Malabar | پۆڵکەی سپی، گیایەکە گەڵاکەی وەکوو سپیناخ بەکاردێت. |
| ملازم = مواطب | Attendant | هەڤاڵ، هاورێ ، یاوەر. |
| ملازم اول | Lieutenant | ئەفسەری پلە یەك. |
| ملازم ثان | Second Lieutenant | ئەفسەری پلە دوو. |

| | | |
|---|---|---|
| ملاحظة | Observing = observation = note | تێبینی، سەرنج. |
| ملاحظ = مراقب | Observer = monitor | تێبین، تێبینیار. |
| ملاسة = مملسة | Roller = Roll | باگردێنێکی لوولەیی‌یە بۆ ڕێکخستن‌و تەخت کردنی زەوی بەکاردێت. |
| ملاسة | Smoothness | ساف، لووسی. |
| ملاثيون | Malathion | ( مالاثیون)، دەرمانی مێش‌و مەگەز. |
| ملآن | Full | پڕ، لێواولێو،تژی. |
| ملانة = حمص اخضر | Green chick peas | فەریکە نۆك، نۆکی سەوز. |
| ملامس = قاطع التلامس | Contact breake | ئامرازێکە بۆ کردنەوەو داخستنی بازنەی کارەبایی. |
| ملامسة = تماس | Touching = contact | بەرکەوتن، لێکەوتن، ڤێکەوتن. |
| ملامح (الوجه) | Lineament | روخسار، سەروسەکوت،سەروسیما، شێوە، بیچم. |
| ملاط = مونة = بياض | Plaster = tectorium = mortar = luting | گەچاو، دۆخاو، گڵ گەچ، قوڕقسڵ، قسڵ‌و لم، پالانچە. |
| ملاك = ملك | Angel | فریشتە. |
| ملاقة = مملقة | Harrow = leveller | ئامرازێکە بۆ تەخت کردنی زەوی. |
| ملاك | Landed Proprietor | خاوەن زەوی‌و زار. |
| ملاكم | Boxer = Pugilist | ئەوکەسەی شەڕە بۆکس دەکات. |
| ملاكمة | Boxing | شەڕە مشتە کۆڵە، شەڕە بۆکس. |
| ملاكية = حشيشية الملاك | Angelica | گیاپەری، گیا فریشتە، ڕووەکێکە لە ڕەگەزی پاقلەو لە کۆمەڵەی چەتر دارەکان. |
| ملافير | Melaphyre | میلافیر، کەڤرێکی گڕکانی ڕەشە. |
| ملاصق = متلاصق | Contiguous = adjacent | پێوەنووساو. |
| ملاصقة | Contiguity = adjacency | پێوەنووسان، پێکەوە نووسان. |
| ملاح | Navigator | دەریاوان، لێخوڕی،(شوفێری) پاپۆڕ یان فڕۆکە یان ئەو کەسەی دەریا دەپشکنێت بۆ دۆزینەوەی شتووەك. |
| ملاح السفينة = نوتي = بحار | Mariner = Sailor = Seaman | کەشتیوان، زریوان، دەریاوان. |
| ملاح فضائي = رائد الفضاء | Astronaut | کەشتی‌یەوانی بۆشایی، کەشتی‌یەوانێکی هەڵبژاردەیە مەشقی تایبەتی پێ دەکرێت بۆ ئەم کارە. |
| ملاحة فضائية = ملاحة جوية | Astronautics = aeronautics | کەشتی‌یەوانی لە بۆشاییدا. |
| ملاح الطائرة | Pilot | فڕۆکەوان. |
| ملاح جوي = طيار | Aeronaut | فڕۆکەوان، کەشتی‌یەوانی بۆشایی. |
| ملاح = ملح | Goose foot = halophyte | ڕووەکی خوێیی، ڕووەکێك لە شوێنێکی شۆرەکاتدا بڕوێت. |
| ملاح | Fig marigold | ڕووەکێکی گۆشنە، گەڵاکەی ئەستوورە هەندێکی دەشتەکی‌و لەبەر گوڵەکەی دەڕوێنرێت. |
| ملاحة = مملحة = منجم الملح | Salt marsh = Salt mine | کانەخوێ. |
| ملاحة | Navigation | کەشتی‌یەوانی، لێخوڕینی فڕۆکە یان کەشتی ئاسمانی، هەروەها دەست نیشان کردنی شوێن‌و ڕێڕەو و دووریی‌و کات بە یارمەتی ڕادارو ڕادیۆ. |

| | | |
|---|---|---|
| ملاحة فلكية | Clestial navigation | کەشتی نێوان تەنە ئاسمانی‌یەکان. |
| ملاحظ = مراقب | Observant = monitor | تێبین، تێ بینییار. |
| ملاحظ العمل - عريف | Foreman | تێ بینییاری ئیش، سەرکار. |
| ملاحظة = مراقبة | Observing = monitoring | تێبینیاریی، چاودێری کردن. |
| ملابس فضفاضة | Loose and waving Clothes | جل‌وبەرگی دەڵب، یان فراوان. |
| ملاخيت أخضر - ملاكيت | Malachite | مالاکیت، کانزای مسی سەوز، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی مس بریتی‌یە لە کاربۆناتی مسی تفت رەنگێکی سەوزی هەیە لە بۆیەکردنی قاپ‌و دەفردا بەکاردێت. |
| ملاطفة | Kind and Courteous treatment | ئارام دان، دڵ خۆش کردن. |
| ملاريا - برداء | Malaria | مەلاریا، لەرزوتا، لەرزوبا، سێ بەڕۆ، نەخۆشی‌یەکی درمەو تیژە یان درێژخایەنە بەهۆی مشەخۆری (بلازمۆدیۆمە) وە بڵاو دەبێتەوە کە بە مشەخۆریی لە لووی لیکی مێشوولەی ئەنۆفیلس دا دەژی ، کە ئەم مێشوولەیە مرۆڤ دەگەزێت میکرۆبەکە دەچێتە خوێنی مرۆڤەکەوەو تووشی نەخۆشی‌یەکەی دەکات، لەرزوتا بە هۆی دەرمانی کنین‌و ئەتابرین‌و بریماکین‌و کلوروکڤین چارە سەر دەکرێت. |
| ملاريا الطيور | Avian malaria | مەلاریای باڵندە |
| ملاعب - رفيق اللعب | Play Fellow | هاورێی یاری. |
| ملاعبة | Deceiving | دەست بازی. |
| ملاعب ظله - رفـراف - قـرلي - ابي الرقص - قاوند | King Fisher | شاماسی گرە، باڵندەیەکی باڵ درێژی مل کورتە. |
| ملاعقي - أبو ملعقة - دواس - مدواس | Spoon bill | کەوچکە، دەنووك کەوچکی، باڵندەیەکی ئاوی سپی یان پەمبەیی لاق درێژە،دەنووکی کەورەیە لە کەوچك دەچێت لە گوێ ئاوی رووبارو دەریادا لەناو قامیشەڵاندا دەژی. |
| ملالوكا | Melaleuca | میلالووکا، دارو وردە دەوەنێکی بچکۆلەیە، گوڵەکەی لە فڵچەی شووشە شتن دەچێت، هەمیشە سەوزە گەلێ جۆری هەیە، گوڵی سپی یاخود سوور یا زەردی کاڵ دەگرن بۆ رازاندنەوەی باخچەکان. |
| ملامسة | Contact | بەریەك کەوتن. |
| ملامس | Contactor | کۆنتاکتۆر، لە ئەندازەی کارەباییدا ئامێرێکی میکانیکی‌یە بۆ گەیاندن‌و بڕینی بازنەی کارەبایی بۆ چەند جارێك، بە چەند رێگەیەك دەخرێتە ئیش. |
| ملبب | Medullated | کرۆکدار،مەغزدار، مەغزاویی. |
| ملبد | Covered | داپۆشراو، بەرگیراو. |
| ملبيجيا | Malpighia = west Indian-Cherry | مالپیجیا، دەوەنێکە لە ناوچە گەرمەکانی ئەمریکادا دەروێنرێت، هەندێکی بۆ رازاندنەوەو هەندێکی لە بەرمەکەی لە بەری گێلاس دەچێت. |
| ملبدة بالغيوم - مغيم | To become thicky Clouded | هەوراوی، داپۆشراو بە هەور. |
| ملبس = لباس | Dress = Clothing = gar ment | پۆشاك، بەلك، جل، کاڵا بەرگ. |
| ملبس = لوز أو نحوه يلبس بالسكر | Sugar almonds = bon bons | نوقڵە بادەمی، بادەمێك شەکری تێ گیرابێت. |
| ملبس بالسكر | Sugar Coated | هەر دەرمانێك خرابێتە قاوغێکی شەکرەوە لەبەر ئەوەی کە تامەکەی ناخۆشە. |

| | | |
|---|---|---|
| ملبسة | Dragee | حەبی دەرمان بەرگی تێ گیرابێت. |
| ملبن = قالب الطوب | Brick mould | قاڵبی خشتی کاڵ. |
| ملبن تركي = راحة الحلقوم | Turkish delight | رەحەتە لقوم، جۆرێکە لە شیرینی هەندێك جار گوێزی تێ دەکرێت. |
| ملبنة = معمل البان | Dairy Farn | کارگەی شیر، کارگەی شیرەمەنی. |
| ملتهم | Glutton = greedy | قووت دەر. |
| ملت = ملط | Malt | ماڵت، دەنکە جۆی چەکەرەکردووی گەرم کراوی وشك کراوەیە، لەدروست کردنی بیرەدا بەکاردێت. |
| ملتهم الجراثيم | Bacteriophage | باکتریا هەڵووشەرە، جۆرێکە لە ڤایرۆس، پەلاماری باکتریا دەدات، دەورو پشتیان دەدات و هەڵیان دەمژێت. |
| ملتهم الذباب | Fly Catcher | مێش خۆرە، باڵندەیەك کە مێش و مەگەز بە فڕیوی لە ئاسماندا دەخوات. |
| ملتقمة الحشرات | Entomophagous | مێروو خۆر، ئەو مێرووە بە سوودانەی کە مێرووی زیان بەخش دەخۆن. |
| ملتقمة كبيرة | Macrophage | خانەیەکی هەڵووشەری گەورە. |
| ملتاز | Maltase | ماڵتێز، هەوێنێکە شەکری جۆ (ماڵتۆز) دەکات بە گلوکۆز (شەکری ترێ). |
| ملتي سامافيت | Multi Samavit | مەڵتی سامافیت،جۆرێکە لە دەرمانی چارەکردنی خوێن کەمی بەشێوەی حەبە. |
| ملتيفين | Multivim | مەڵتیڤیم، دەرمانێکە بۆ چارەکردنی هەندێك نەخۆشی لە منداڵاندا وەکوو کەمی ئیشتیاو پشێویی گەدەو ریخۆڵەو سك چوون، بەشێوەی حەب هەیە. |
| ملتصقات الأصابع | Syndactyls | پەنجە نووساوەکان، بەشێکە لە باڵندەکان وەکوو ماسیگرە (قرلی). |
| ملتفة | Twining = Voluble | خۆپێچەرەوە ئەو قەدەی یان ئەو رووەکەی کە خۆی لە رووەکی ترەوە دەپێچێت وەکوو لاولاو، فاسۆلیا. |
| ملتهمة الثمر | Carpo capsa pomonella = muscicapa | میوەخۆرە، کرمی سێو، مێروویەکە بەری سێوو قەیسی و هەڵوژە دەخوات. |
| ملتوية = لنتانا | Lantana | لانتانا، مینای درەخت، درەختی مینا، دەوەنێکە بۆ رازاندنەوە بەکاردێت. |
| ملة السرير | Mattress | دۆشەك، سەرجێ. |
| ملتحمة | Conjunctive | لکێنە، ئەو پەردەیەی کە دیوی دەرەوەی گلێنەی چاوو دیوی ناوەوەی پێڵوی چاوی داپۆشیوە. |
| ملتزم = متعهد = مقاول | Contractor | بەڵێندەر ،مقاویل |
| ملتهب | Phlogtic Ardent | داگیرساو، ئاوساو. |
| ملتهب = مشتعل | Conflagrant, lagrant | گرگرتوو، سووتاو. |
| ملتوي | Convoluted = Distonted = Wry = sinuous = Loxic | پێچاو پێچ،خوار، خوارو خێچ. |
| ملتون | Melton | مێلتۆن، قوماشێکی خوریی نەرمۆڵەیە قاپوتی لێ دروست دەکرێت. |
| ملتقى نهرين | Delta | دوو ئاوان، دوواو. |
| ملتقى | Junction | شوێنی بەیەك گەیشتنی دووتەل یەکێکیان لە ئاسن و ئەوی تریان لە مس بێت، ئەگەر ئەو شوێنە گەرم بکرێت ئەرکی کارەبایی پەیدا دەبێت. |
| ملتقي | Meeting place = rendezvous | جێگای بە یەك گەیشتن. |
| ملتصق = ملتحم | Coherent | نووساو، پێکەوە نووساو. |
| ملتصق الأذنين | Synotus | گوێچکە نووساو. |
| ملثة | Maltha | ماڵثا، مادەیەکی رەشی لینجە لەنێوان پەترۆڵ و ئەسفەلتدایە. |
| ملجا | Shelter = Refuge | پەنا، پەناگە، دالدە، شوێنی خۆشاردنەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ملجأ العجـزة = دار العجزة | Valetudinarium = Geroconium = Cacosomium | تەمەڵخانە، خانەی پەک کەوتەکان. |
| ملجأ القطاء | Brephotrophium | هەتیوخانە. |
| ملجين | Mulligan | مولیگان، خواردەمەنییەکە لە سەوزەو گۆشت یان سەوزەو ماسی دروست دەکرێت. |
| ملح | Salt | خوێ، نمەک، هەک، مادەیەکە (ئاوێتەیەکە) لە گۆڕینـەوەی هـایدرۆجینی ئەسیدی (ترشـی) بە کانزایـەک "میتـاڵێک پـەیدا دەبێـت وەکـوو خـوێی چێشت کە بە زۆری لە ئاودا دەتوێتەوە". |
| ملح قاعدي | Basic salt | خوێی تفت، هەر خوێیەک رەگی هایدرۆکسیدی (OH) تیادا بێت، کاغەزی گوڵەبەڕۆژە دەکات. |
| ملح مزدوج | Double salt | خـوێی دووانـە، جووتـە خـوێ ، خوێیەکـە لـە ئـەنجامی یـەکگرتنی دوو خوێی جیاوازەوە پەیدا بووە، وەکوو زاخ کـە لـە کـاتی تواندنـەوەیدا لـە ئاودا دوو ئایۆنی جیاواز، دوو موجەب یان دوو سالب پەیدا دەکات. |
| ملح الطعام | Kitchen Salt = Sodium chloride | خوێی چێشت. |
| ملح الصفراء | Bilesalt | خوێی زراو، بەردی زراو. |
| ملح البارود - نترات البوتاسيوم | Saltpetre | خوێی بارووت، شۆرە. |
| ملـح البـارود الأعتيـادي - نطرون | Nitre = Saltpetre | خوێی بارووتی ئاسایی، پۆتاسیۆم نیترایت. |
| ملح موهر | Mohrs salt | خوێی مۆهەر، بریتیە لە گۆگرداتی ئامۆنیۆمی ئاسنۆزی. |
| ملح بارود شيلي | Chile salt peter = chile nitre | خوێی باروتی شیلی، سۆدیۆم، نیترات، نیتراتی سـۆدیۆم، وەکـوو پـەین بەکاردێت. |
| ملـح انطلـيزي - ملـح افرنجي - ملح ابسوم | Bitter purging salt = Epsom salt | ئینگلیزدوزی، خوێی ئینگلیزی، ئیپسوم سوڵت، ئیزیاسولفەیت، مانیزیا، مەگنیسیۆم سولفەیتی ئاویی، ئامەکەی تاڵە بۆ رەوان کردن باشە. |
| ملح الليمون | Citrate | خوێی لیمۆ، سیترات. |
| ملح معدني | Mineralsalt | خوێی مەعدەنی، خوێی کانی. |
| ملح منظم | Buffer salt | خوێی بوفەر، خوێی رێکخەر بۆ ئامادەکردنی گیراوەیی بەکاردێت. |
| ملح روشيل | Rochelle salt | خوێی رۆشیل، خوێی سۆدیۆم پۆتاسیۆم تارتارەیت، مادەیەکی بلووریـی بێ رەنگە، ئاوێتەی لێ دروست دەکات. |
| ملح كلوبر | Glaubers salt | خوێی گلۆبەر، سۆدیۆم سولفەیتی ئاویی. |
| ملـح الأمونيـا = كلوريـد الأمونيوم = ملح النشادر | Ammonia salt = ammonium chloride | خـوێی ئـامۆنیوم، لەدروسـت کردنـی پـاتری کارەبایی و قوماش و پێسـتەو چینکۆکردنی ئاسندا بـەکاردێت، ئـەم مادەیـە بـە رێگـەی پێشەسـازی گـازی خەڵوز یان بە گەرم کردنی ئامۆنیا لە ترشی هایدرۆکلۆریکدا ئامادە دەکرێت. |
| ملح الطعام الصخري | Rock salt = Halite | خوێی بەردین، هالایت، جۆرێکە لە خوێی چێشت بەشێوەی کریستاڵە، رەنگەکەی بە پێی پاک و پیسی دەگۆڕێت هەندێک جار پەڵەی سپی یـان سور یان خۆڵەمێشی تیادایە، بۆ دروست کردنی سۆدەی شێن بەکاردێت. |
| ملح ميود | Iodized salt | خوێی یۆداوی ، بریتی‌یە لە خوێی چێشت(کلۆریدی سۆدیۆم) بە رێژەی (١) بۆ (٥٠٠٠) یۆدیدی پۆتاسیۆمی تێ دەکرێت. ئەمە بۆ نەخۆشی لووی ژێر قوڕقوڕاگە (الغدة الدرقية) باشە. |
| ملحي - أليف الملح | Halophile | هۆگری خوێ، ئەو رووەکەی کە حەز بە خاکی خوێدار دەکات. |
| ملحي | Saline | خوێیی، هەرشتێک پەیوەندی بە خوێوە هەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ملحة | White blackish | سپی مەیلەو رەش. |
| ملحاوات | Deciduous | گەڵاوەریبوەکان، ئەو رووەکانەی کە لە پایزو زستاندا گەڵاکانیان دەوەرێت. |
| ملحق (ملحقات) | Appended = Accessories = appendage | پاشکۆ، پاشەر، پاشەرۆ. |
| ملحق العيار | The rider of the measure (weight) | پارسەنگ. |
| ملحمة | Fierce battle = Glorious battle | داستان، شەڕێکی مەزن، جەنگێکی مەزن. |
| ملحمة = لحمة = برنشيمة | Parenchyma | پارینکیما، شانەیەکە لە لەشی رووەکدا لە خانەی زیندوو پێکهاتووە. |
| ملحومات الفك | Plectognathi | چەناگە ئاوساوەکان، پلەیەکە لە ماسی‌یە ئێسکدارەکان. |
| ملحن موسيقي | Composer | تەرانەباز، ئاوازدانەر. |
| ملخ (المفصل) - سخ - خلع | Dislocation | لەجێ چوونی جومگە. |
| ملخص | Extract = abstract = summary | کورتە، وەکوو کورتەی نوسراوێك. |
| مل دائري | Circular mil | میلی بازنەیی، یەکەیەکی پێوانەیە بریتی‌یە لە ١/١٠٠٠ ئینچ چوارگۆشە بۆ پێوانی برگەی تەل. |
| ملدوغ | Bitten = Stung | گەزراو، پێوەدراو، مارانگاز. |
| ملديون | Melodeon | میلۆدیۆن، ئەرگۆنێکی (ئامرازی مۆسیقا) یە لە شێوەی شمشاڵ بچووك دایە. |
| ملريت | Millerite | میلیرایت، ئاوێتەی گۆگردیدی نیکل. |
| ملزة - صمولة | Washer = nut | واشەر، سەمووە، سەموونە، پارچەیەکی خڕی تەنکی بچووکە لە چەرم یان لە ئاسن کونێکی تیایە ئەخرێتە ژێر برغووەوە لە کاتی بادانیدا بۆ ئەوەی قایم بێت. |
| ملزم - موجب | Obligatory | پێویستە. |
| ملزمة - منجلة | Vice | مەنگەنە، ئەسکەنە، گیرە، دوو پارچە ئاسن یان تەختە بە کلیلێك پێکەوە ئەبەسترێن شتومەك ئەخرێتە نێوانیانەوە بۆ پەستاوتنیان. |
| ملزمة (من كتاب) | Section = quire | بەشێك لە کتێبێکی چاپکراو. |
| ملزاج - مقياس اللزوجة | Niscometer = Visco simeter | لینجی پێو. |
| ملزج | Sticker agent | مادەی لینجکەر، مادەیەکە دەکرێتە دەرمانی قەلاچۆکردنی قەوزەو مێرووەوە بۆ ئەوەی زیاتر بلکێت بە رووەکەکەوە. |
| ملزنات - راصات | Agglutinins | مادە تۆپەڵ کەرەکان، ئەو مادانەی کە دەبنە هۆی نووسانی مادەی تر بە یەکتری‌یەوە. |
| ملساء | Glabrous | ساف، لووسی، بێ موو، بێ تووك. |
| ملستومة - ساذج هندي | American goose berry | دارو دەوەنێکی ناوچە گەرمەکانە، بەرەکەی بۆن و تام خۆشە، ئاوگەکەی رەشە ئاودەم دەباغ دەکات. |
| ملساوات | Anacanthini | لووسەکان، پلەیەکە لە ماسی‌یە ئێسکدارەکان. |
| ملص - انزلاق = افلات | Slipping away, escaping | دەرباز بوون، خلیسکان. |
| ملصاف = منظار الألوان | Fluoroscope | فلۆرۆسکۆپ، ئامرازێکە بۆ دۆزینەوەی "تەماشاکردنی" پێکهاتنی ناوەوەی لەشی زیندوو بەهۆی تیشکی ئێکسەوە. |
| ملصقة | Affiche | |
| ملصقات | Glutinates | |

| | | |
|---|---|---|
| ملصوق | Stuck = Pasted | پێوەلکاو، پێوەنووساو. |
| ملصة = اطوم | Dugong | ووشتری دەریا، گیاندارێکی شیردەری دەریاییە بەشی دواوەی لەشی لە هی ماسی دەچێت. |
| ملطاس = كاسور | Stone hammer | پیک، تاخورک، بۆ شکاندنی یان کون کردنی بەرد. |
| ملطاط = مالج | Trowel | ماڵە، بۆ قورەکاری بەکاردێت. |
| ملطف - مسكن - ملطف الألم | Attenuant = Emolliant = paregoric = Optudent = demulcent = mitigate = moderate | ئارام دەر. |
| ملعب | Play ground | یاریگە، یاریخانە، گۆرەپان. |
| ملعب المصارعة | Wrestling yard | زۆرخانە، گۆرەپانی زۆرانبازی. |
| ملعب - مسيل للعاب | Ptyalogogue = sialagogue | لیک دەردەر، هەرشتێک ببێتە هۆی دەردانی لیک. |
| ملعي = ظيان السياج - شراج | Oldmans beard = flower of sick ness yellow Flower | گوڵە بەروون، ریشە پیرانە (بەزاری کوردی حاجی عومەران)، گوڵەجان (بەکوردی قەرەداغ)، تەریەتمە (لەئامێدی) بێبێلاوە (لە شەقلاوە) گوڵەزەرد ( لە زێوێ). |
| ملعة - ملعي - ظيان السياج | Clematis | یاسەمەنی کێویلە، رووەکێکە لە رەگەزی گوڵاڵە سوورە،ئاوەکەی توون و ژەهرە، هەندێکی بۆ ئارەق کردنەوەو میزکردن بەکاردێت گوڵەکەی ئەرخەوانی یان سپی یان شین یان زەردە. |
| ملعقية = حشيشة الملاعق - حشيشة الحفر - او الأسقربوط | Scurvy grass = cochlearia | گیاکەوچکە، کەوچکە گیا، گیا ئەسکەربوون، گیایەکی پزیشکییە لە کوزەڵە دەچێت. |
| ملعقة | Spoon = Spatula | کەوچک، کەفچک، ئەسکوێ. |
| ملعقة احتراق - ملعقة اشتعال | Deflagrating spoon | کەوچکی سووتاندن. |
| ملعقة شاي | Tea Spoon | کەوچکی چای. |
| ملعقة مواد | Spatula | کەوچکی مادە کیمیاییەکان. |
| ملغم | Amalgam | ئەمەلگەم، جۆرێکە لە دارشتە جیوەی تیایە لەگەڵ کانزای تردا هەندێ سوودیان هەیە، وەکوو ئەمەلگەمی زیو کە بۆ پڕکردنەوەی ددان بەکاردێت. |
| ملف - وشيعة | Coil = wrapper | کلافە، کلۆڵە. |
| ملف - اضبارة | File = dossier | دۆسێ، فایل. |
| ملف التنغيم | | بەکرەی ئاواز، کلافەی ئاواز. |
| ملف توازي | Shunt winding | کلافەی تەریبی لە ئەندازەی کارەباییدا، کلافەیەکە بە شێوەیەکی تەریبی لەگەڵ بەشێک لە بازنە سەرەکییەکەوە دەبەسترێت. |
| ملف توال | Series winding | کلافەی یەک لەدوای یەک، لە ئەندازەی کارەباییدا: کلافەیەکە بە شێوەیەکی یەک لەدوای یەک بە بەشێک لە بازنە سەرەکییەکەوە دەبەسترێت. |
| ملف كهربائي | Coil = armatnre | کۆیل، تەلێکی هەڵپێچراوە کارەبا دەگەیەنێ. |
| ملف حلزوني - ملف لولبي | Hrlical Coilcspring solenold | کلافەی مارپێچی، کلافەی زەمبەلەکی، تەوژمی کارەبایی پێدا تێپەڕ دەکرێت، بۆ دەست کەوتنی کایەی موگناتیسی. |

| | | |
|---|---|---|
| ملف الحث - رمكورف | Induction | كلافەی هاندانی کارەبایی. |
| ملف رومكورف | Ruhmkorff induction coil | كلافـەی (ئارمێچـەری رۆمکـۆرف) لـە لایـەن زانـای فیزیـای هـەنریش رۆمکۆرفـەوە داهێـنراوە بریـتی یـە لـە كلافەیـەك بـۆ هـاندانی کارەبـا بـۆ بەرزکردنەوەی هێزی فۆلتی تەزوویەکی کارەبایی گۆڕاو. |
| ملف خانق | Choke coil | كلافەی خنكێنەر، كلافەیەكە لە بازنەی کارەباییدا بەکاردێت بۆ نەهێشتنی یان کەم کردنەوەی لەرەلەری بەرز، هەروەها كلافەیەکی هاندەرە. |
| ملفاف - خنزيرة - ونش | Hand winch = Windless | ئامرازێکی کارە بۆ بەرزکردنەوەی شتوومەك. |
| ملفاف | Wheel and axle | رەوڕەوەو تەوەرە، دەزگایەكە لە رەوڕەوەیەك پێكهاتووەو لەسەر تەوەرەیەك جێگیر كراوە بۆ مەبەستی تاقیكردنەوە بەكاردێت. |
| ملفوف | Convoluted | پێچراو، لول کراو. |
| ملفوف - كرنب = بقلة الأنصار - لهانة | Cabbage = Turnip Cabbage | کەلەرم، کەلەمی. |
| ملفوف بحري - كرنب بحري | Sea Cabbage = sea Kale | کەلەرمی دەریایی، سەوزەیەکی تەمەن درێژە لە کۆمەڵەی خاچی‌یەکان لە قەراغ هەندێك دەریادا دەروێت، یان دەروێنرێت. |
| ملفوف لفتي - كرنب لفتي - روتباغا | Swede = Swedish Turnip | کەلـەرمی شـێلمی، کەلـەرەمی سـویدیی جۆرێکـە لـە کەلـەرم رەگـەکانی ئەستوورن وەکوو شێلم بەکاردەهێنرێت. |
| ملفوفة - دولمة | | یاپراخ، دۆڵمە. |
| ملق | To smooth = to Flatter | نەرم کردنەوە، سافکردن. |
| ملقح | Pollinated = Fecundated | ئاووس، چات کراو، سەراو، چاکراو. |
| ملقحة | Fertilizen | بەپیت کەر. |
| ملقوحة - جنين = فوف | Embryo | بەرخۆلە، ئاولەمە، کۆرپەلە. |
| ملقط - ماسك - ماشة - جفت | Forceps = Tongs = Tweezer | مەقاش، گاسك، ئاگرگر،جفتە، مووکێش. |
| ملقط (للحشرات) | Chelicera | پەلی ماشەدار، وەکوو لە هەندێك مێرووودا. |
| ملقط السكر | Sugar tings | مقاشی شەکر. |
| ملقط غسيل | Clothe spin | گیرەی جل، جل گرە، گرە، دەکرێت بە تەنافەوە. |
| ملقط النار - ماشة | Tongs = apair of tongs | مقاش،مقاش، ئاگر/ ئاگرگر. |
| ملقوط - ملتقط | Picked up = Foona | دۆزراوە. |
| ملقاط الجوز | Nut picK | گوێز هەڵکۆلەر، ئامرازێکی سەرباریکە کاکڵەی گوێزی پێ دەردەهێنرێت. |
| ملقى = مطروح | Thrown | فرێدراو. |
| ملك = مليك | King | شا، پادشا، پاشا. |
| ملكة | Queen | شاژن. |
| ملكة | Faculty = genius | زەین روونی، بەهرە، توانایی، ئامادەیی، سروشتی لە مرۆڤدا . |
| ملك خاص | Possessory | ئارزی. |
| ملك | Property = estate = possessions | خانووبەرە،زەوی زار، سامان، موڵك. |
| ملك - ملاك | Angel | فریشتە. |
| ملك أو ملكة او ولد في ورق اللعبة | Court Card | شا یان، شاژن، یان کوڕ لە کاغەزی قوماردا. |

| | | |
|---|---|---|
| ملك النسور = نسر ملكي | King Vulture | شا سیسارك، جۆرێکی گەورەیە لە سیسارك. |
| ملك الجراد | Hosura | شێرە کوللە، کوللەیەکی گەورەیە. |
| ملك السرطان | King carb = Xip hosra | شا قرژاڵ. |
| ملك السراطين | Limulus | شاقرژاڵ، گیاندارێکی دەریاییە لە کۆمەڵی جومگەدارەکانە. |
| ملكة النمل | | شا مێرووله، گەورەی مێرووله. |
| ملكة النحل | Queen bee | شاهەنگ، هەنگێکی گەورەیە گەرا دادەنێت و شانە هەڵ ئەبەستێت لەناو پوورەکەدا. |
| ملكـــة المــــروج - اكليل بوقيصي | Queen of the meadows | شاژنی مێرگ، جۆرێکە لە رووەك. |
| ملكة الشعر أو التصوير | Genius for poetry | بەهرەی شیعردانان یان وێنەکێشان. |
| ملكة مرغريتا - لؤلؤية - اسطر الصين. | Queen Marguerite = chinaaster | شاژن مارگریتا، ئەستەری چین. |
| ملكية - تملك | Ownership | خاوەندارێتی |
| ملكية الأرض | Topography | تاپۆ. |
| ملكية خاصة | Private property | موڵکدارێتی تایبەتی. |
| ملــل - مـــلال - ضجر - سأمة | Anxiety = wear ness = boredom | بێ تاقەتی، دڵ تەنگی، وەڕس. |
| ملم | Malm | مالم، (١) جۆرێکی نەرمە لە بەردی قسل، (٢) تێکەڵاوی قوڕو قسل. |
| ملم - قشاشة | Rake | شانەی باخچە، بۆ پاکردنەوەی باخچە. |
| ملماس - عضو اللمس في الحشرات | Palpus = palps | هەستیار، هەستوەر، ئەندامی هەست کردن لە مێروودا. |
| ملموس | Tangible = perceptible = palpable | هەست پێ کراو. |
| ململ = مكحلة | Kohl stick = eyepencil | کلچێوك، قەڵەمی چاورشتن. |
| ململ (قماش) | Muslin | مەلمەل، موسلین، قوماشێکی تەنکە وەکوو شاش وایە. |
| ملنخوليا - سوداء | Melancholia | ماخۆلان، پشێوییەکی دەمارییە بە خەمو خەفەتی زۆرەوە. |
| ملنيت | Melnite | مێلینایت، مادەیەکی تەقەمەنی بەهێزە. |
| ملهى - مسرح | Theatre | شانۆ. |
| ملهى ليلي | Night Club = play house | یانەی شەو،کەباریە، تیاترۆ. |
| ملوان - مقياس اللون | Colorimeter | رەنگ پێو، ئامرازی پێوانی تینی رەنگ. |
| ملوحة | Salinity = Saltness | سوێریی، بڕی خوێ لە ئاودا، بە غرام لە لیترێك ئاودا دەپێورێت. |
| ملوي - ملتوي | Contorted | بادراو. |
| ملول - بلوط رومي - سنديان رومي | Valonia Oak = Quercus aegilops | بەرووی رۆمی، جەوتەکەی بۆ دەباخ کردن بەکاردێت. |
| ملوث | Contaminanted | پیس، پیس بوو، هەندێك جار مادەیەك چالاکی تیشکدانەوە پەیدا دەکات لە ئەنجامی تێکردنی بڕێکی کەم لە مادەی تیشکدەرەوە. |
| ملوث | Contaminant | پیسکەر. |
| ملوسة = ملاسة | Smoothness | ساف، لووسی. |

| | | |
|---|---|---|
| ملوخية - ملوكية | Jews mallow = malta Jute = Potherb Jute | تۆڵەکە جوولەکانە، گیایەکی ساڵانەیە بەرزێکی بچووکی لاکێشەیی و گوڵێکی بچووکی زەردی هەیە، گەڵاکەی ئەکرێت بە چێشت، لە سپیناخ ئەچێت لە میسر زۆرە لە کۆمەڵەی تۆڵەکەیە لە هندستان لە توێکڵی قەدەکەی ریشاڵ و پەت دروست دەکەن. |
| ملوز | | خورمایەك دەنکە بادەمی تیادابێت. |
| ملوق | Spatula | کەوچکێکی مەعدەنی دەم پانە ئەجزاچی دەرمانی پێ تێکەڵ دەکات. |
| ملوث | Dirty | پیس، هەرمی. |
| ملوكي = فخم | Majestical | شایانە، نایاب. |
| ملون | Chromatic = Chromatogonous | رەنگین، رەنگاورەنگ،ئاڵ و واڵا. |
| ملونة - حاملة اللون | Chromatophore | تەنی رەنگ هەڵگر. |
| مل | Mil | یەکەی درێژییە، دەکاتە بەشێك لە هەزار بەشی ئینجێك، بە تایبەتی بۆ پێوانەی تیرەی تەل بەکاردێت. |
| ملي | Milli | میلی، بەشێك لە ملیۆن بەش. |
| مليء | Full | پڕ، تژی. |
| ملء الفم | MouthFul | پڕ بەدەم. |
| ملي | Mallee | (مالی)، جۆرێکی بچووکە لە درەختی یوکالیپتۆس. |
| مليخ - مسيخ | Tasteless | بێ تام، بێ خوێ. |
| مليسة - ترنجان - حشيشة النحل = حبق ترنجاني - بادر نجبوية | Melissa = lemun balm | ترنجۆك، رووەکێکی پزیشکییە ، بە شێوەیەکی دەشتەکی لە ناوچەی شێدار یان لە نزیك ئاودا دەروێت لە ولاتی شامدا زۆرە، دەشێت بۆ رواندن، ئاوەکەی بۆنی لیمۆی لێدێت، لای خۆمان دەکرێتە چاییەوە بۆن و تامەکەی خۆش دەکات. |
| ملين - مسهل خفيف | Laxative = Aperient = Eccoprotic = opening = Malalactic = Demulcent = Diachorema | دەرمانی شل کردنەوە،دەرمانی نەرم کردنەوە، واتە ئەو دەرمانەی کە بۆ نەرمکردنەوە یان خاوکردنەوەی قەبزی بەکاردێت. |
| ملين - رعامين | Mallein | ماڵینین، پێکوتێکە بۆ دەست نیشان کردنی نەخۆشی (رعام، glanders) لە ولاخدا بەکاردێت. |
| مليص = خديج | Abortus | نەبەکام، لە دایك بوون بەر لەکاتی ئاسایی خۆی منالی لەبارچوو. |
| مليون | Millon | ملیۆن، هەزار هەزار، ملیۆن. |
| مليونير | Millionair | ملیۆنێر، لۆرت، کەسێك لە ملیۆنێك زیاتر دۆلار یان جونەیهی هەبێت. |
| مليار | Milliard | ملیار، هەزار ملیۆن. |
| مليمايكرون | Millimicron | میلیمایکرۆن ١/١٠٠٠ مایکرۆن،١ ملیۆن ملیمەتر. |
| مليمتر | Millimeter | ملیمەتر-١/١٠٠٠ مەتر. |
| مليبار | Millibar | ملیبار، یەك بەش لە هەزار بەشی بار یان هەزار بەشی داین، پێوانەیەکە بۆ پاڵەپەستۆ (پەستانی) هەوا. |
| مليغرام | Milligram | میلیگرام، هەزار یەکی گرامێك =١/١٠٠٠ گرام. |
| ملي فولط | Millivolt | میلیڤۆڵت، بەشێك لە هەزار بەشی ڤۆڵت. |
| ملي امبير | Milliampere | ملی ئەمپێر ١/١٠٠٠ ئەمپێر، |
| مليكوري | MilliCurie | میلیکووری، بەشێك لە هەزار بەشی کورییەکەی تیشك دانەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| مليرونتكن | Milliroentgen | ميليرونتكەن، يەكەی تيشك دانەوە، بريتی‌يە لە بەشێك لە هەزار بەشی رۆنتگەن. |
| مليفاراد | MilliFarad | ميليفاراد، بەشێك لە هەزار بەشی فاراد. |
| مليلامبرت | MilliLambert | ميليلامبێرت، بەشێك لە هەزار بەشی لامبێرت. |
| مليثانية | MilliSecond | ميليچركە، بەشێك لە هەزار بەشی چركەيەك. |
| مليلتر | Milliliter | ملی لەتر ١/١٠٠٠ ليتر. |
| مليهنري | Millihenry | ميليهەنری، بەشێك لە هەزار بەشی هەندی. |
| مليم | Millieme | مليم، بەشێك لە هەزار بەشی جونەيهی ميسری‌يە. |
| مليلس | | رووەكێكە گەڵاكەی دژی رەوانی‌يە بەڵام بەرەكەی بۆ رەوان كردن بەكار ئەهێنرێ. |
| مليساء | Molluscum | نەخۆشی‌يەكی پێستە گرێی نەرمی لەگەڵ بێت. |
| مليساوات - نواعم | Mollusca | نەرمۆڵەكان، كۆمەڵە گياندارێكن. |
| مليف | | ناتر، كيسە كێش، ناتری گەرماو. |
| مليح | Pretty = hand some | ئێسك سووك، .نەشميلە، جوان كەلە. |
| مليط - أملط = لاشعر له | Hairless | بێ تووك. |
| ملينثوس - عسلية | Melianthus | گوڵە هەنگوین، رووەكێكە گوڵەكەی شيلەيەكی شيرينی تيادايە. |
| مماثل | Identical | وەكوو يەك، لێك چوو. |
| مماثلة | Analogy | لەيەك چوون. |
| ممارسة = تدريب | Practice = training | مەشق كردن. |
| ممالاة - تحيز | Partiality | لايەنگيری. |
| مماحكة | Quarrel | شەڕكردن. |
| ممارس - صاحب مهنة | Practitioner | مەشق كەر، مەشق كردوو. |
| مماس - مماس | Tangent | چيغ كەر، هێڵی چيغ كەری بازنە، لێ كەوت،چيغ كراو. |
| مماسة | Contiguity | هاوسێ‌يەتی، نزيكی |
| مماتنة - محاكاة | Mimicry | لاسايی كردنەوە. |
| ممانعة - معارضة | Objection = Opposition = Inductive | بەرگری كردن. |
| ممانعة مغناطيسية | Reluctance | بەرهەڵستی موگناتێس، نەهێشتنی موگناتيس، بريتی‌يە لە رێژەی نێوان ئەو هێزی موگناتيسی‌يەی كە كار دەكاتە بازنەيەكی موگناتيس، بۆ ئەو لێشاويی موگناتيسی‌يەی كە لێوەی پەيدا دەبێت. |
| ممبة | Mamba | مامبا، مارێكی ئەفريقی ژەهرداره. |
| ممبريطة | Porthole | پەنجەرەی پاپۆر. |
| ممتحن | Examiner = one who examines | تاقيكار، تاقی‌كەرەوە. |
| ممتحن | Examined = tried = tested | تاقيكراوە. |
| ممتص | Absorbed | مژراو. |
| ممتليء - مملؤ | Full | پڕ، تژی. |
| ممتصية | Absorptivity | مژينێتی، رێژەی بڕی ئەو تيشكەی كە رووەك دەيمژێت بۆ بڕی ئەو تيشكەی كە دەكەوێتە سەری. |

| | | |
|---|---|---|
| ممتز = ماز | Absorbent | خەست کەرەوەی گەردی گاز، رووەژ. |
| ممتلىء الجسم | Robust = thicKest = sleeK | گۆشتن، خرپن، خرپپر، خرو خەپان. |
| ممثل | Nummer = actor | نوێنەر، ئەکتەر، بەتایبەتی لە شانۆگەرییەکی بێ دەنگدا. |
| ممحاة (للكتابة) محاية | Eraser = rubber | خەت کوژێن، لاستیکی خەت کوژانەوە. |
| ممخضة = ممخض - شكوة - نحي | Churn | مەشکە، ئامرازی ژەنینی ماست بۆ جیاکردنەوەی رۆنەکەی. |
| ممخوض - مخيض | Butter milK | سیرێژ، شیری کەرە. |
| مخضة ذات ارياش | Vane churn | جۆرێکە لە مەشکە لە کێڵگە گەورەکاندا بۆ دروست کردنی کەرە بەکاردێت. |
| ممدوح | Laudable | شایانی شایستەیە (جدیر بالثناء). |
| ممر - ممشى | Passage = Corridor = Via | ڕاڕەو، دالان، ڕێ گوزار، ڕێباز، باریکەڕێ، دەرەتان، دەربازگە. |
| ممر حلزوني | Helicotrema | ڕاڕەوێکی پێچاوپێچ. |
| ممر انفي - مسلك انفي | Nasal Passage | کونە لووت، ڕێبازی لووت. |
| ممر جبلي | Pass = mountainpass | دەربەند. |
| ممر ضيق | Narrow passage | دەرتەنگ |
| ممر مائي | Water passage | بوار. |
| ممـــر تنفســـي - مسلك تنفسي | Respiratory passage | ڕێبازی هەناسەیی. |
| ممراح | Bobolin | باڵندەیەکی کۆچ کەری دەنگ خۆشە، مرۆڤ پێکەنینی بە دەنگەکەی دێت، جۆرێکە لە ڕیشۆڵە. |
| ممران = ماميران - عـروق الصـباغين - عروق صفر | Celandine | زەردەچەوە، ڕەوان کەرە، بۆ کۆکە ڕەشەو سەرما باشە، گیایەکە گەڵاکەی شین کارە گوڵەکەی گـەورەو زەردە، شیراوێکی سووتێنەری زەردی تیایـا ڕەنگێکی زەردی لـێ دەردەهێنرێت. |
| ممرض | Dresser = attendant = orderly = ward | برین پێچ، تیمارکەر (بۆ پیاو). |
| ممرضة | Nurse = sister | برین پێچ، تیمارکەر، نەخۆشەوان،پەرستان (بۆ ژن). |
| ممرض | Pathoge | هەر زیندەوەرێك ببێتە هۆی نەخۆشی. |
| ممرود | Totread upon | پلیشاوە، وردکراو. |
| ممزق | Torn = rent | شڕ، شڕوپڕ، دڕاو، پێژراو، ونجرونجر، پارچە پارچە، لەتو پەت. |
| ممزي | Malmsey | مالمزی، جۆرێکە لە شەرابی شیرینی بۆنخۆش. |
| ممس - وصلة عصبية | Synape | لە گیانداره بالاکاندا، ئەو پارچە دەمارییەی کەراگەیاندنی دەماری پیایدا تێپەڕ دەبێت لە نیو ڕۆنێکەوە بۆ لقۆکەکانی نیو ڕۆنێکی تر. |
| ممسوخ | Deformed = defaced | نەنگە سار، ناڕێك. |
| ممسوس | Maddish | دێوانە، شێتۆکە، کەمێك شێت. |
| ممسحة | Eraser = rubber | سڕەوە، کوژێنەرەوە، تەخت سڕ، لاستیکی خەت کوژێنەرەوە. |
| ممسحة المنزل | Mop | گەسکی ماڵ سڕینەوە. |
| ممساح | Graphometer | پێوەری ڕووبەر، دەستگایەکە بۆ پێوانی گۆشەو ڕووبەر. |
| ممسح | Pantometer | ڕووپێو، ئامرازێکە بۆ پێوانی گۆشە ئاسۆیییەکان لە ڕوو پێواندا (مساحە) بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ممسوح | Wiped = rubbed off | سرِراوه. |
| ممسكة | Cigarette holder | دارجگەره. |
| ممساك = كلاب = قبض | Catch | قولاب، گیره. |
| ممسك = مسكي = عنب مسكي | Muscat = muscat-grape = muscadine-grape | ترێی مسکی، جۆرێکی تایبەتییە لە ترێ تامێکی تایبەتی هەیە. |
| ممسك | Reserved | بەستی ئاو، ئاوبەست. |
| ممسك الأعنة = صاحب المعز | Auriga | خاوەنی بزن، جلەوگر، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە. |
| ممشطة | Teasingt | چەکی هەلاجی. |
| ممشطة الغزل | Carding machine | ئامرازی داهێنانی خوریی، شانەی رستن. |
| ممشاط | Rake | ئامرازێکە بۆ داهێنانی گڵی زەوی کێڵگە. |
| ممشقة | Scutcher = scutching machine | ئامرازی شیکردنەوەی لۆکەو کەتان. |
| ممشوق القامة | Slender = Slim | بالأدرێژ، بالأبەرز، خەرامان. |
| ممص | Sucker | مژەر، مژۆك، ئامرازی مژین، ئەندامی مژین. |
| سس | Haustorium | مژۆك، وەکوو مژۆکی رووەکە مشەخۆرەکان. |
| ممصة اللبن = مصاصة | Tetrelle | مژەری شیر، شیرمژ. |
| ممص = ماصة | Pipet = pipetee | مژەر، مژۆك، بۆرییەکی باریکی پلەدارە بۆ پێوانی قەبارەی شلەو گواستنەوەی بۆ قاپێکی تر بەهۆی مژینەوە. |
| ممضوغ | Chewed = masticated | جووراو. |
| ممطار = مقياس المطر | Pluviometer = Rain gauge | باران پێو، ئامرازی پێوەری باران. |
| ممغطس = ممغنط | Magnetized | موگناتیساوی. |
| ممكن | Possible | شیاو، لواو، گونجاو. |
| مملاص | | ئەو ژنەی کە زوو زوو منالّی لەبار بچێت. |
| مملط | Decalvant | |
| مملكة | Kingdom | ولأت، شانشین. |
| مملكة الحيوان | Animalking dom | کۆمەڵەی گیاندارەکان. |
| مملكة النبات | Vegetable Kingdom | کۆمەڵەی رووەکەکان. |
| مملحة = وعاء الملح | Saltceller | خوێ دان. |
| مملح = مملوح | Salted | خوێ کراو، سوێرکراو. |
| مملحة = منجم الملح | Salina | کانی خوێی،کانە خوێ، خوێ زار، هەر گۆمێك خوێی زۆر تیادابێت سوودی لێ وەربگیرێت. |
| مملوخة | Fargment = Twig slip | خەڵف، هەر ئەمامێك رەگی پێوەبێت. |
| ممنى | Milt | لووی زاووزێ لە نێرەدا. |
| مملوك = عبد = رق | Slave | کوێلە. |
| مملؤ | Full of | پڕ، لێوان، تژی. |
| مملكة = عالم | Kingdom | جیهان، شانشین. |
| مملكــة حيوانيــة = مجموعة حيوانية | Animal kingdonm | جیهانی گیانداران، کۆمەڵەی گیانداران. |

| | | |
|---|---|---|
| مملكة نباتية - مجموعة نباتية | Plantkingdom | جيهانی رووەك، كۆمەڵەی رووەك. |
| ممناعـــة كهربائيـــة - عازل كهربائي | Electricinsolator | بەربەستی كارەبا. |
| ممنوح | Granted | بەخشراو. |
| ممنوع | Inhibited | قەدەغەكراو، ياساغ. |
| ممواج - كيموغراف | Kymograph | كيموگراف، پێوەری درێژی شەپۆل، دەزگايەكە بۆ تۆماركردنی جووڵەكانی هەناوی مرۆڤ، ئامرازی تۆماركردنی جووڵەو پەستان. |
| مموهة | | چاوێكی تاناويی، چاوێك تانەی لەسەربێت. |
| ممور = ممازة | BananaPlantation | باخی مۆز. |
| ممكهة - اداة طباخة | Masher | مەكينەی چێشت لێنان. |
| مميت | Mortal = lethal = Fatal = Deadly | كوشندە، مرێنەر. |
| ممية | Breast | مەمكۆڵە، فەرامۆشە. |
| ممية - جباس | Mamme | مامی، درەختێكی ناوچە گەرمەكانە، زەمق دەرئەكات، بەرێكی گەورەی هەيە، ئەخورێت تۆوەكەی بۆ كرم فڕێدان و تونكڵەكەی بۆ تاو و شيلەكەی بۆ ميزكردن بەكار ئەهێنرێت. |
| مميزة - مميزات | Diagnostic = characteristic | جياكەرەوە، سيفەت، خەسڵەت. |
| مميلة = مقياس الميل | Inclinometer | لاريی پێو، ئامرازی پێوانی لاريی. |
| مميثا = ماميثا | Glaucium = horned poppy | ماميسا، گلاوسيەم، خاشخاش شاخدار. |
| من - ارقة - قمل نباتي - حشرة المن | Aphids = Aphis | مێشی گەزۆ، ئەسپێی رووەك، سن، كيسەڵە، مێروويەكی بچووكی سەوزە زيان بە رووەك ئەگەيەنێت. |
| منّ | | پێوانەيەكە بۆ كێش- ۱۸۰مثقال. |
| منّ السماء - عسل الندى - سلوى - ترنجبين | Manna | گەزۆ، شۆكە، گەزوە، زلنبۆ،(۱) مادەيەكی شيرينە لەسەر گەڵای رووەكی بە روو و مازوو ئەبينرێ، حەڵوای لێ دروست دەكرێت هەروەها بە شێوەی دەرمان بۆ رەوان كردن بەكاردێت مادەيەكی شەكرييە يان تێكەڵاوە لە شەكرو ديكسترين لە لايەن هەندێك رووەكەوە دەردەدرێت لە خۆيانەوە يان بە قلیشاندنەوەی تونكڵەكەی يان بە كاری هەندێك مێرووی قرمز.<br>(۲) ترنجين، جۆرە مێش و مەگەزێك هەيە كە پێی ئەوترێت (زە) لەسەر گەڵای بەڕوو ئەژی ، لە باكووری عێراق، مادەيەكی هەنگوينی شل دەرئەدا كە دوايی ئەبێت بە كريستاڵی دەنك بچووك لەسەر گەڵاكان، گەڵاكان ئەكرێنەوەو ئەخرێنە سەر پارچە قوماشێك وە بە دار پيايان ئەكێشرێت، دەنكەكان بە هەندێ پارچە گەڵاوە ئەوەرێنە سەر پارچە قوماشەكە ئينجا ئەكوڵێنرێ وە ئەپاڵێورێ و حەڵواو گەزۆی لێ دروست ئەكرێت بەڵكو شتێكی سروشتی ئەبارێت لە شەوێكدا يان چەند شەوێكی دوا بەدوای يەك دوو يا سێ بەسەر زەويشدا ئەبارێ، هيچ جۆرە مێش و مەگەزێك نابينرێ بەو شێوە، زۆرەی كە ئەم شيلەيە دەربدات.<br>(۳) شيراوێكە لە دارە رەش دەردەهێنرێت (پەيدا دەبێت) بريتييە لە شەكری چەندينە كە ئەميش لە زنجيرەيەك لە يەكەی شەكری ماڵتۆز پێكهاتووە لە لايەن چەند زيندەوەرێكی ميكرۆسكۆبييەوە دروست دەبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| منار | Land marK | ئەو نیشانەیە کە لەسەر ریگاوبان دادەنریٚ بۆ ریٚ بەدی کردن و زانینی ماوەی نیٚوانی شارەکان. |
| منارة - منار | Light house | منارە، فەنەری ریٚنمایی کردنی کەشتیوانەکان. |
| منارة - هركول | Rorqual | نەهەنگیٚکی مەزنە پەرەکەیەکی گەورە وا بە پشتییەوە لە منارە ئەچیٚت. |
| منارة المسجد - مئذنة | Minaret | منارەی مزگەوت. |
| مناخ | Climate | ئاو و هەوا، باری ئاوو هەوای ناوچەیەك (هەریٚمیٚك) لە ماوەی سالیٚکدا وەکوو پلەی گەرمی و پەستانی هەوا . |
| مناخ محلي | Microclimate | ئاوو هەوای ئیقلیمی، ئیقلیم گیر، ئاوو هەوا لە ناوچەیەکی تایبەتیدا. |
| مناخ جاف | Arid climate | ئاوو هەوای وشك. |
| مناه استوائي - مناخ مداري | Tropical Climate | ئاوو هەوای ئیستیوائی. |
| مناخ رطب | Humid climate | ئاوو هەوای شیٚدار. |
| مناخ رطب جاف | Wet dry Climate | ئاوو هەوای شیٚداری وشك. |
| مناخي | Climatic | ئاوو هەوایی، هەرشتیٚك پەیوەندی بە ئاوو هەواوە هەبیٚت. |
| مناسب | Adequate = suitible = fit | شیاو، گونجاو، لەبار. |
| مناسل - غدد تناسلية | Gonads | لووەکانی زاووزیٚ. |
| مناسبة | Cause = relation | بۆنە، شیاوی، گونجاوی لواوی، هەل، دەرفەت. |
| مناعة | Immunity = lathergy | بەرگری، بەرگەگرتن، خۆراگرتن، بەرگری کردنی لەش بەرامبەر بە نەخۆشییەکان. |
| مناعة سمية | Mithridatism | بەرگریی ژەهری، جۆریٚکە لە بەرگری لە لەشدا پەیدا دەبیٚت لە ئەنجامی وەرگرتنی ژەمی ژەهر بە شیٚوەیەکی ئەوتۆ کە بەرە بەرە زیاد بکات. |
| مناعة صناعية | Artifical Immunization | بەرگری دەستکرد، ئەوەی بە پیٚکوت(لقاح) دەکریٚتە لەشەوە. |
| مناعة طبيعية | Natural Immunity | بەرگری سروشتی، بەرگە گرتنی سروشتی. |
| مناعة مصلية | Sero immunity | بەرگری بە پلازمای خویٚن. |
| مناعة سلبية | Passive Immunity | بەرگری سەلبی. |
| مناعة مكتسبة - مناعة منفعلة | Acquired Immunity | بەرگری وەرگیراو، بەرگری دەستکەوتوو، بەرگری دەستکەوت، ئەو بەرگرییەی کە لە ئەنجامی کوتانەوە لە لەشی مرۆڤدا پەیدا دەبیٚت بۆ نمونە ئەگەر مرۆڤیٚك بە پیٚکوتی زەرداوی خویٚنی وڵاخیٚك بکوتریٚ کە پیٚکوتی نەخۆشی دەردە کۆپانی تیٚ کرابیٚت. |
| مناعة وقتية - مناعة قبلية - مناعة سبقية | Premunition | بەرگریی پیٚشوویی. |
| مناعة خلقية - مناعة فطرية | Congenital Immunity | بەرگریی زگماکیی. |
| مناعة عرقية | Racial immunity | بەرگری رەگەزی یان رەگی. |
| مناظرة - جدال | Debate = Specolation = inspection | وتوویٚژ. |
| مناطحة | Butting | شەرە قۆچ. |
| مناطق زراعية | Agricultural regions | ناوچەی کشتوکاڵی. |

| | | |
|---|---|---|
| مناطق شبقية | Erogenous zones | ناوچه ئالۆشاوییەکان، هەندێك ناوچەی هەستیار بۆ دەست لێدان‌و گەرمی لە لەشدا کە ئالۆشی رەگەزیی دەوروژێنن. |
| مناظر - مشابه | Analogus = similar | لێك چوو. |
| منافعة - تبادل المنفعة | Mutualism | ئالوگۆری سوود. |
| منامي - حكمي | Oneiric | خەویی، هەرشتێك پەیوەندی بە خەوەوە هەبێت. |
| مناوشة - نزال | Skirmish = bicKering | بەرەنگاری، بەرەنگاربوونەوە. |
| منام | Bed | نوێن، پێخەف، نڤێن. |
| منامة | Nightdress | جل‌و بەرگی شەو، وەکوو پێجامەو دشداشە. |
| منافس | Competitor | خەلیم، خەنیم، بە بەربەرەکانێکار. |
| منافسة | Competition | دڕدۆنگی، بەربەرەکانی کردن. |
| منافي | Disagreement = opposing | دژ، دژایەتی. |
| مناقشة - جدال | Discussion | مشت‌ومڕ، لێدوان، گفتوگۆ. |
| مناورة - مناورة حربية | Maneuvere | مانۆڕ، مەشق کردنی (نمایش) لەشکر لەسەر چەکی هەمە جۆر. |
| مناجذ - خلد | Molerat = blindrat | مشکە کوێرە. |
| مناقعي | Uliginous | زەلکاویی، هەر رووەکێك لە شوێنێکی زەلکاودا بڕوێت. |
| منبر | Pulpet | سەکۆ، بەرزەك، شوێنێکی بەرزە وتاری لەسەر ئەخوێندرێتەوە. |
| منبية | Intutator | بۆرییەکە دەخرێتە ئەندامێکی بۆشەوە وەکوو بۆری هەوا بۆ ئەوەی بە کراوەیی بمێنێتەوە. |
| منبت | Origin | بنەڕەت، بناغە. |
| منبت الظفر | Nail matrix | بێخی نینۆك، بنی نینۆك. |
| منبت -مزرعة | Culture mediuml | هەرمادەیەك زیندەوەرە وردەکان بیخۆن‌و لەسەری زاوزێ بکەن دەشێت لەو مادەیەدا گۆشتی جنراو و ئاو و پیپتۆن‌و خوێ هەبێت. |
| منبت - مشتل | Nursery | شەتڵگە. |
| منبت الريش (في الطائر) | Pteryla | شوێنی رووانی پەڕ لە لەشی باڵندەدا. |
| منبذ - دن | Vat = tun | کوپەیەکی گەورە لە تەختە یان گڵێنە، ترێی تیادا بترشێندرێت. |
| منبذة - معمل النبيذ | Winery | کارگەی شەراب. |
| منبطح | Ventricum bent | لەپەر رووکەوتوو. |
| منبسط | Expanded = flat | تەخت، تەختانی، کشاو، پان، پەحن. |
| منبع | Spring = water source | کانی، سەرچاوە، چاوانە، سەروکانی. |
| منبع | Head waters | ئەو جۆگانەی کە دەبنە دەست پێ کردنی یان سەرچاوەی رووبارێك. |
| منبعج | Flat | قوپاو، تەپیو، ئاڤێکداچوی. |
| منبه - منشط - مسكن | Sedative = excitor | ئارامدەر، هێمنکەرەوە، وەکوو هەندێك دەرمان. |
| منبه - مؤثر | Stimulus = Affective = Stimulant | وریاکەرەوە ، کارتێکەر. |
| منبه خارجي | External stimulus | وریا کەرەوەی دەرەکی. |
| منبه داخلي | Internal stimulus | وریاکەرەوەی ناوەکی. |
| منبوذ | Caste | دەرکراو، خوێڕی، بێزراو. |
| منبض - منبضة | Pulsometer | ئامرازی پرتەگرتن، پرتەگر، پرتەپێو. |

| | | |
|---|---|---|
| منباض - مرسمة النبض | Sphygmograph | وێنەگری پرتە. |
| منبض | Place where the pulse is felt | ئەو شوێنەی کە پرتە (نبض) تیادا هەست پێ دەکرێت. |
| منت | Monte | (مۆنتا) جۆرێکە لە یاری بە کاغەز دەکرێت. |
| منتخب - مختار | Selected = Chosen | گوزیدە، هەڵبژێرراو. |
| منتحي - متنحي | Recessive | شارراوە. |
| منترة | Nitre bed | کانە خوێی نیترات. |
| منتظم - منظم | Regular = Regulate | رێكوپێك، رێك، پێك، رێكخراو، پوخت، كۆك. |
| منتاخ | Protractor | ئامرازێکە بۆ دەرهێنانی تەنی بیانی لە برین. |
| منتدلي | Montadale | مۆنتیدال، جۆرە رەگەزێکی مەڕی ئەمریکییە، دەموچاوی سپییەشاخی نییە. |
| منتج | Producer = Productive = reproductive | بەرهەم هێنەر. |
| منتجات = منتوجات | Yield product | بەرهەم، بەروبووم. |
| منتجات ثانوية | Secondary products | بەرهەمی دووەمی ، پاشە بەرهەم، پاشەبەر. |
| منتصف | Middle | ناوەڕاست، نیوە. |
| منتصف النهار = ظهر = ظهيرة | Noon = midday | نیوەڕۆ، نیڤرۆ. |
| منتبه | Awake = Vigilant | هۆشیار، هشیار، ئاگادار، بە ئاگا. |
| منتفخ - متورم | Flat went varicosis = Inflated = puffy = Turgid = Ventricose | پەنماو، ئاوساو. |
| منتفخات = فهقيات | Telrodontidae | ئاوساوەکان، پفەکان، پەلێکە لە ماسییە شەویلگە نووساوەکان وەکوو: ماسییە پفەو ژیشکی دەریا. |
| منتقاة | Staddle | هەڵبژاردە. |
| منتاش - منتاف | Pincers = Volsella | ئامرازی دەرکێشان، گاز. |
| منتاش | Bullet Forceps = Iwee zers = Vulsellum | مووکێش، مقاشی بچووك. |
| منتوجات اللبن | Diary products | شیرەمەنی، وەکوو شیرو ماستو کەرە . هتد. |
| منتنة = فساء الكلب | Stinging goose foot = Dogs orache | تس، سەگ، رووەکێکی بۆگەنە، گەڵاو گوڵەکەی هەندێك مادەی زەمقیو خوێیی تیادایە وەکوو کاربۆناتی ئامۆنیۆمو نیتراتی پۆتاسیۆم کە دەبنە هۆی ئەو بۆگەنە. |
| منتن = نتين = كريه الرائحة | Fetid | بۆگەن. |
| منتين | MenThene | مێن ثین، هایدرۆکاربۆنێکی چەوری بێ رەنگە. |
| منتيرة | Montero | مۆنتیرۆ، شەبقەیەکی خڕە. |
| منتح | Porus | کونیلەدار. |
| منتيفور - منتيقور | Manticore | مانتیکۆر، گیاندارێکی ئەفسانەیە سەری لە سەری مرۆڤو لەشی لە لەشی شێرو کلکی لە کلکی ئاژدیها چووە. |
| منتوج - منتج | Product | بەرهەم، بەروبووم. |
| منتش | Hot bed = Seed bed | قاپێکە تۆوی تێ دەکرێت بۆ چەکەرەکردن. |
| منتشة = ملط | Malt | ئەو تۆوانەی کە چەکەرەیان پێ دەکرێت (وەکوو جۆ) بۆ بیرە. |
| منتشر | Spread | بڵاو، بڵاوبووە، بەڵاڤ. |

| | | |
|---|---|---|
| منتشر باللمس | Contactile | هەرشتێك بەدەست لێدان بڵاو ببێتەوە. |
| منثول - جوهر النعناع | Menthol | مینثۆل، جۆرێکە لە ئەلکهول لە ئارەقی نەعناعدا هەیە بۆنی خۆشە بۆ مەبەستی پزیشکیو کەمکردنەوەی ئێشو ئازارو سووتانەوەی لووت بەکاردێت. |
| منثور - شبوي - خيري | Annual stock = hand Flower = bleeding heart = Gilly Flower = wall Flower-cheiranthus | شەوبۆ، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی خاچیەکان بە زۆری گوڵی زەرد دەگرێت. |
| منثور بري - شمشم - خمخم - لخنيس | Gilli Flower = Campion = roseCampion = lychnis | شەوبۆ کێویلە، ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی مێخەك، گوڵەکەی بەشێوەی هێشووی زەرد یان سوورە. |
| منثر | Spreader | پرژێنەر، ئامرازی پرژاندن وەکوو پرژێنەری پەین. |
| منجدة - مندف | Teasing bow | ئامرازی شیکردنەوەی خوری. |
| منج - لوز | Almond | بادەم. |
| منج | Green gram | ماشی سەوز. |
| منجر - فارة النجار | Plane | رنە، ئامرازی دارتاشین، ڕەندەی دارتاشی. |
| منجرة | Bench | مێزی دارتاش، ئەو مێزەی کە دارتاش ئیشی لەسەر دەکات. |
| منجور | Noria = water wheel | جەنجەڕ، بۆ هەڵکێشانی ئاو لەبیر. |
| منجزات - مكتسبات | Achievements | دەستکەوتەکان. |
| منجع = مرعى | Pasture | لەوەڕگە. |
| منجل | Reaping hook = sicKle | داس، داسماڵ، دەعس، شاڵۆك، مەراغان، بۆ دروێنەی گەنمو جۆ. |
| منجل صغير = شرشرة | SicKle = reaping-hooK | داسولکە، داسك، داسۆك قالۆچك. |
| منجل كبير | Scythe | مەلەغان، ئامرازێکە بۆ درەوکردنو گزرە خستن. |
| منجل ذو يدين | Scythe with two handle | کێڵەندی، داسێك دوو دەسکی هەبێت. |
| منجل طويل الذراع | Long handled scythe | داسی دەسك درێژ. |
| منجلي المنقار | Sickle bill | دەنووك داس، داسولکە دەنووك باڵندەیەکە وەکوو باڵندەی بەهەشت (طائر الفردوس)وژەوژکەرە، (طنان) دەنووکی چەماوەیە (هەڵگەڕاوەیە). |
| منجبي - حودل | Mangaby | مانگابی، مەیمونێکی کلك درێژە. |
| منجب - فحيل | Thorough bred stud | ئەسپی پەڕیێن، ئەسپی تەرخان کراو بۆ زاوزێ. |
| منجمد | Frozen = iced = Frosted | بەستوو بە سەرما، بەستەڵەك، بەستەڵۆك، ڕچ. |
| منجا = عنبا - انبه - منجو - منكو - منفا - انبج - قورس | MangoTree | عەنبە، عەمبە، درەختێکی ناوچە گەرمەکانە بەرەکەی ناوك دارە خۆشە دەخورێت یان دەکرێت بە مرەبا یان بە شەربەت. |
| منجنيق | Mangonel = ballista | گڕهاوێژ، مەنجەنیق، ئامرازێکە لە شەڕدا بەکار ئەهێنرا بۆ هاویشتنی گوللەی ئاگرین یان هەر هاوێژراوێکی قورس وەکوو بەرد. |
| منجم | Mine | کان، کانگە، چاڵێك یان ئەشکەوتێك لەژێر زەوییدا مەعدەن یان خەڵوزی لێ دەردەهێنرێت. |
| منجم الفحم | Colliery | کانەخەڵووز، کارگەی خەڵووز. |
| منجم | Astronomer | ئەستێرژمێر، ئەستێرەناس، ئەستێرەشوناس، هەسارەناس. |
| منجوس - نمس | Mongoose | بانبانکە، مریشك خۆرە |

| | | |
|---|---|---|
| منجوس | Unclean | پیس، بۆگەن، گیانداری بۆگەنە. |
| منجم الملح - مملحة | Salt mine | کانە خوێ، خوێ زار، خوێ یەلان. |
| منجق | Small gazell | ئاسکە کێوییەکی بچووکە. |
| منجروف | Mangrove | مانگرۆف، درەختێکی ناوچە گەرمەکانە تۆێکڵەکەی دەرمان و مادەی دەباخی لێ دەردەهێنرێت. |
| منحبس | Incarcerated | گیراو، قەتیس ماو، حەپسکراو، بەندکراو، گەمارۆدراو. |
| منحرف - مائل | Oblique | لاداو، قیراج، لار. |
| منحرف المزاج | Indisposed | خوێندن. |
| منحة دراسية او تعليمية | ScholarShip | بەخشیش خوێندنی، یارمەتی بۆ خوێندن، خەڵاتی خوێندن. |
| منحرف الأسنان | Loxodant | ددان خوار. |
| منحرف الصحة | Indlsposed | نەباشی تەندروستی. |
| منحــرف النظــر - لا نقطــي - لابؤري | Astigmatic | ئەستگماتیك، نەخۆشییەکە لەچاو یان لە زەرەبینی چاودا، وا لەو تیشکانە دەکات کە لە خاڵێکەوە (نقگە) لە شێ‌کەوە دەردەپەر ن کە لەیەك خاڵ ـی تیشکۆدا (بۆرە) کۆ نەبنەوە، لەبەر ئەوە ئەو شتە بە ئاشکرایی نابینرێت. |
| منحني | Graph = Curve | چەماوە، ئەندازگەی (شوێنی ئەندازەیی) ئەو هێڵەی کە (٣) خاڵـی سەری ناکەونە سەر یەك هێڵی راست. |
| منحني - خط بياني | Curve | چەماوەی روونکردنەوە. |
| منحني بياني = رسم بياني | Diagram | هێڵکاریی روونکردنەوە. |
| منحني المنقار | Curvirostral | دەنووك چەماوە،، وەکوو لە هەندێك باڵندەدا. |
| منحني الراس | Nutant | سەرشۆڕ، کەسێك کە خەواڵوو بێت سەری شۆڕ بکاتەوە. |
| منحني التوازن الحراري | Equillbrium dlagram | چەماوەی هاوسەنگی گەرمی، ئەو چەماوەییە کـە سنووری پێکهات و پلەی گەرمی پێکهێنەرەکانی دارشتە دەست نیشان دەکات. |
| منحني المبين (رسم المبين) | Indicator diagram | چەماوەی نیشـاندەر ، ئـەو چەماوەییـە کـە پـەیوەندی نێـوان پەسـتان و قەبارەی هەڵم یان گاز نیشان دەدات لە لوولەکی ئامرازی گەرمییدا. |
| منحل - قفير | Stand For bees = hive = bee = hive | کوورەی هەنگ. |
| منحلة - عمائر | Apiary | کێڵگەی هەنگ. شوێنێکی گەورە بۆ بەخێوکردنی هەنگ. |
| منحبس البول - مزرم | Anuretic | میزگیراو، کەسێك میزی گیرابێت. |
| منحة - جائزة | Gift = benef action = prize | بەخشیش ، خەلات. |
| منحدر | Sloping = Slating | لێژ، نشیو، کەچ، نشێڤی، بەرەوخوار، بەرەوژێر، سەرەوخوار. |
| منحدر | Slope = ramp = dedivity | لێژایی، نشێوی، بەرەو ژێرکە. |
| منخر - منخر - ثقب الأنف | Naris = nostrill | کوونە لووت، تفنگ، کۆناتفنێ، بیرتاخ، کوونی کەپو، فرنك. |
| منخربات - فورامنيفيرا | Foraminifera | فۆرامینیفیرا، گیاندارێکی دەریایی پلە نزمە سەدەفەکەی کونکونە. |
| منخع - قفا العنق - نقرة العنق | Nuch | پشت مل، بۆقەتەی مل. |
| منخفض | Low = depressed | نزم، نشێو، نەوی، کەم، نشێڤی. |
| منخفض | Depression = low | نزمایی، نشێویی، نشێڤی، نەوی ، نزمایی. |
| منخفض التركيز | Hypotonic | پەیتی نزم، گیراوەیەك پەیتییەکەی نزم بێت. |
| منخل صغير | Small bolter | نەرمەبێژ، بێژنگی وردبێژ. |

| | | |
|---|---|---|
| منخل | Bolter = Sieve = Sifter | بێژنگ، قەلبیر، هێڵەک، سەرەن. |
| منخول | Boltea = Sieved | بێژراو، بێژراوە. |
| منخور | Decayed = rotten = Carious | کلۆر، کونکون، شکاو. |
| منخاس = منخس | Goad = Sting | نەقیزە، زختە، چیف. |
| منخفض جوي | Depression = low | نزمایی کەشی، چەقی پەستانی کەشی، نزم لەگەڵ ئەو بایانەی (ریاح) کە دەوری دەدەن. |
| منخفض (ارضي) | Low land | نزمایی زەوی. |
| منّ | Maund | مەن، پێوانەیەکی کێشی هیندییە ئەکاتە ٨٢/٢٨ پاوەند. |
| مندفة - منجدة | Teasing bow | ئامرازی هەلاجی، ئامرازی شیکردنەوەی لۆکە، چەکی هەلاجی، چەکەو کەوان، کەوانی هەلاجی. |
| مندف و قوس | Teasing and bow | چەکو کەوان، مشتەو کەوان. |
| مندوف - منفوش | Carded = teased | شیکراوە، وەکوو لۆکەو خوری. |
| مندمج | Adnata | پێکەوە نووساو، وەکوو ئەندامێکی لەش چووبێت بە ئەندامێکی تردا. |
| مندالة = میطدة | Rammer | مێکوت، بۆ ڕێکخستن ی رووی زەوی. |
| مندثر | Wiped = effaced = obliterated | فەوتاو، لەناوچوو، نەماو. |
| منديل - كفية | Napkin kerchief | دەستەسڕ، مەنگیل، چارۆگە. |
| منديل المائدة | Napkin | سەرمێز، سفرە. |
| مندل | Aloes-wood | داری عود، جۆرە مادەیەکە ئەگەر بخرێتە ئاگرەوە بۆنێکی خۆش دەدات. |
| منديلية = قوقحان المروج | Crownmarigold Crown daisy | |
| مندلية | Mendelism | مەندلێتی، مندلیزم، بیروڕای زانا مەندل لە زانستی زکماکیدا، تیوری ئەو سیفەتانەی کە لە دایکو باوکەوە دەچن بۆ نەوەکانیان، بە شێوەی: یاسای یەکەم: یاسای جیابوونەوە (کانوون الانعزال). یاسای دووەم: یاسای دابەشکردنی سەربەخۆ(قانون توزیع المستقل). |
| مندريل | Mandrill | ماندریل، مەیمونێکی زۆر ترسنۆکو ناشیرینەو گەورەیە، لە خۆرئاوای ئەفریقادا دەژی. |
| مندليفيوم | Mendelevium | مەندەلیڤیۆم، توخمێکی کیمیایی تیشکدەرەوەی دەستکردە کێشی ئەتۆمییەکەی (٢٥٦) و ژمارەی ئەتۆمییەکەی (١٠١) لە ساڵی (١٩٥٥) زدا دۆزراوەتەوە بە ڕێگەی هاویشتنی تەنۆکەی ئەلفای ووزەبەرز(٤١ ملیۆن ئەلکترون فۆڵت) بۆ سەر توخمی ئاینشتاینیوم نیشانەکەی (Md). |
| مندي = هبار = قرد مقدس | Solemnmapes | مەیمونێکی پیرۆزە لای هیندییەکان. |
| مندغم | Adnate = inserted | بە یەکداچوو. |
| مندولين | Mandolin | ماندولین، جۆرێکە لە ئامرازی مۆسیقا. |
| مندوليني - عازف المندولين | Mandolinist | ماندۆلین ژەن، ئەو کەسەی ئامرازی ماندۆلین لێ دەدات. |
| مند عورة | Jerusalem artichoke | سێوی بن زەوی، سێوەی بن ئەرز، سێلک. |
| مندرين = ليمون افندي - يوسفي | Mandarin-orange = Tangerine Tree | لالەنگی، جۆرە درەختێکە لە کۆمەڵەی لیمۆ، بەرەکەی لە پرتەقاڵ دەچێت. بچووکترو شیرینترە، بە ئاسانی توێکڵەکەی لێ دەکرێتەوە. |
| منذر = محذر | Premonitory | ئاگادارکەرەوە. وووریاکەرەوە. |
| منزع الحب | Sheller | ئامرازی جیاکردنەوەی تۆو لە توێکڵی بەر. |

| | | |
|---|---|---|
| موراي | Moray | مۆرای، جۆرێکە لە مارماسی واتە لە ئەنکلیس. |
| مورد حسي | Afferent | هێنەری هەستی، دەمارە هێنەرەکان راگەیاندەکان لە ئەندامەکانی هەستەوە دەبەن بۆ دەماری چەقی. |
| مورفولوجيا - علم الشكل | Morphology | مۆرفۆلۆجی، شێوەزانی، زانستی شێوەی گیاندارو رووەك: لەش کۆ ئەندام، ئەندام، خانە . هتد. |
| مورين | Moraine | مۆراین،ئەو تۆپەڵە کەڤرو بەردانەی کە لە بەستەڵەکی سەهۆڵ جیا دەبنەوە لە کاتی توانەوەیدا. |
| موردة - رودنتة | Rhodanthos | گوڵی گوڵەباخ. |
| موردنبة - مرنبة | Rabbit warren = garenne | کێڵگەی بەخێوکردنی کەروێشك. |
| مورميرايدا - عروس البحر - حورية الماء | Mormyrida = mermaid | بووکی دەریا. |
| موريل | Morello | (١) بەلاڵووك، جۆرە رووەکێکە بەرەکەی لە گێلاس ئەچێت بەلام بچووکترە، شیرین و کەمێك تفتە.<br>(٢) جۆرێکە لە گێلاس. |
| مورث - جين | Gene | جین، هەڵگری سیفەتی زکماکی لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی تر. |
| موروث | Inherit | رەوشتێکی شیاو بۆ گواستنەوە بەرێگەی کنێتی. |
| مورد | Resource | دەست کەوت، سەرچاوە، دەرامەت. |
| مورينا - عقاب البحر | Eagle ray | داڵی دەریا، جۆرە ماسی‌یەکە. |
| مورق | Leafy | گەڵادار، پشکفتی، |
| مورق | Stationerhoner | ئەو کەسەی کە شتومەکی نووسین دەفرۆشێت. |
| مورينة | Morina = whorl flower | مۆرینا، جۆرە رووەکێکی گوڵدارە. |
| مورفين | Morphine | مۆرفین، مادەیەکی نیمچە ئەڵکالی سپی رەقە، لە تلیاك دەرئەهێنرێت بۆ مەبەستی سڕ کردن و کەم کردنەوەی ئازار بەکاردێت، دەرمانێکی ئەوتۆیە زۆرجار ئەبێت بە خوویەکی ترسناك لەو کەسەدا کە بەکاری ئەهێنێت. |
| مورفينية | Morphinism | مۆرفینیزم، مۆرفینێتی، مۆرفین کێشان، بەنگ کێشان. |
| موركت | Morkit | مورکیت، دەرمانێکە بۆ لەناوبردنی مێروو. |
| مورد | Deferent | هێنەر، سیفەتی بۆرییەك یان دەمارێك کە راگەیاندنی دەماریی بهێنێت. |
| مورنجة - بان | Moringa | درەختێکە بەرەکەی زۆر رەش و بۆن خۆشە کە ئەگرێت بە تەزبیح و ملوانکە بۆ یاری پێکردن. |
| موز - موزة | Banana | مۆز، دەوەنێکە گەڵاکەی پان و درێژە، بەرەکەی درێژ کۆلەیە بەشێوەی هێشوە، چەند جۆرێکی هەیە، هەندێکی بەرەکەی مزرە دەکرێت بە چێشت یان بە ئارد، هەندێکی شیرینە ئەخورێت. |
| موز فحل | Indian Shot = Cann Indica | زەمۆز، مۆزی رازاندنەوە، مارزوان، رووەکێکی پیازۆیە سەلکی هەیە، گەڵاکانی سەوزو گەورەن، گوڵی سپی و زەردو پەمبەیی و سوورو پرتەقاڵی ئەکرێت. |
| موزاييك التبغ - داء الفسيفساء | Mosaic | ئەخۆشی مۆزایك، نەخۆشی‌یەکی رووەکی‌یە تووشی تووتن ئەبێ لە فیرۆسەوە ئەبێ، پەڵەی سەوزی تێر یان زەرد لەسەر گەڵاکان پەیدا ئەبێ و گەڵاکانی چرچ ئەبن و رووەکەکە نارێك ئەبێ. |
| موز الجنة | Banana of paradise = Adams apple | رکێشە، مۆزی بەهەشت، جۆرێکە لە رووەکی مۆز، بەرەکەی لە بەری مۆزی ئاسایی گەورەترە مادەی نیشاستەی تیایە بە کوڵاوی ئەخورێت. |

| | | |
|---|---|---|
| موز ليفي - ابق - قنب مانيلا | Manila hemp = abaca | گوشی مانیلا، جۆرێکە لە ڕووەکی مۆز گوشی لێ دەرئەهێنرێ بەرەکەی بچووک‌و ترش‌و شیرینە. |
| موز كـاذب - ببايـا - باباز - دباء الهند | False banana = Papaw = Papaya = melontree | باباز، مۆزە درۆزنە، درەختێکی ئەمریکی‌یە لە دارخورما دەچێت بەرەکەی زەردوهێلکەیی‌و خۆشە. |
| موزي | Collimator | کۆلیماتۆر، دەزگایەکە بۆ هێنانە بەرهەمی چەپکی هاوتەریب لە تیشک وەکوو ڕووناکی یان ئەلیکترۆن. |
| موز لية | Moselle | مۆزێل، جۆرێکە لە مەی. |
| موزيت | Musette | مووزێت، زوڕنای مەشکە، جۆرێکە لە زوڕنا لەمەشکەی ئاو دەچێت. |
| موزع الشرارة | Sparktransmitter | (دیلکۆ) ئەو ئامرازەیە کە تەوژمی کارەبا دەگەیەنێت بە مۆمی سووتان لە ئۆتۆمبیلدا. |
| موس الحلاقة | Razor | گوێزان، گوێزانی ڕیش تاشین. |
| موسع الأوعية | Vasodilator | بۆڕی فراوانکەر، هەر دەرمانێک بۆڕی خوێن فراوان بکات. |
| موسع البؤبؤ | Mydriatic | بیبیلە فراوانکەر، وەکوو هەندێک دەرمان. |
| موسيقى | Music | مۆسیقا، مۆزیقە، جۆرێکە لە هونەرە جوانەکان، ساز. |
| موسيقي | Musician | مۆسیقار، مۆسیقاژەن. |
| موسيقي - مختص بالموسيقى | Musical | مۆسیقی، ئەوەی پەیوەندی بە مۆسیقاوە هەیە. |
| موسيقار - عازف الكمان | Virtuoso | سازبەند، کەمانچە ژەن. |
| موسية | Mousse | مووس، جۆرێکە لە حەلْوا لە قەیماغ دروست دەکرێت. |
| مؤسسة - منشاة - معهد | Institution | دامەزراو، پەیمانگە، خوێندنگە. |
| موسم الأمطار | Wet season | وەرزی باران. |
| موسلين | Muslinmousse line | مۆزلین، جۆرە چنراوێکی(قوماشێکی) لۆکەی تەنکی نەرمە. |
| موسا سورس - موسا سور | | (موسا سورەس) گیاندارێکی خشۆکی دەریایی کەتەی قرتێ کەوتووە. |
| موسكوفايت | | راجع (مسكوفايت). |
| موسكردين - شلل وردي | Silk worm disease | نەخۆشی‌یەکە تووشی کرمی ئاوریشم ئەبێت. |
| موسكي - خشب الصنوبر | Pine | تەختەی کاژ، تەختەکەی سپی مەیلەو سوورە پتەوە دەرگاو پەنجەرەی لێ دروست دەکرێت. |
| موسكيدي - غزال المسك | MusK deer | ئاسکی مسک. |
| موسع | To cause wider | گەورەکەر، فراوانکەر. |
| موسعة المبال | Urethr eurynter | فراوانکەری میزەڕۆ، فراوانکەری چووک. |
| موسوعة علمية - دائرة المعارف = معلمة | Encyclopedia | ئینیسکلۆپیدیا، فەرهەنگێکی زانستی فراوان، فەرهەنگێکی گشتی هەموو زانیاری‌و زانستی‌و هونەرەکان. |
| موسوعي | Encyclopedic | ئینیسکلۆپیدیایی، هەرشتێک پەیوەندی بە ئینیسکلۆپیدیاوە هەبێت. |
| موسم | Season | وەرز، کژە. |
| موسمي | Monsoon = Seasonal | وەرزی. |
| موسم الحراثة | Season of ploughing | کاشتە، وەرزی زەوی کێڵان. |
| موشور - منشور - موشور زجاجي | Prism = glass Prism | پوازک، ئاوێزە ، تەنێکی کریستاڵی ڕوونە بۆشی کردنەوەی تیشکی خۆر بەکاردێت، چەند جۆرێکی هەیە (سێ پاڵە، چوار پاڵە، وەستاو، لار). |

| | | |
|---|---|---|
| مؤشر | Sign = Mark = indication | پیشاندەر، میل. |
| موشحة = موشحات | Muwashah | جۆرێکە لە گۆرانی عەرەبی. |
| موص - قش | Straw | پووش، کا. |
| موصلين | Muslin | موسلین، قوماشێکی لۆکەی تەنکە. |
| موصل = ناقل | Conductor | گەیێنەر، هەر مادەیەك ماوە بدات بە تێپەڕبوونی تەوژمی کارەبا بە ناویدا، یان گەرمیو دەنگ بگەیەنێت. |
| موضوع | Subject | بابەت، وانە، باس، دەربارە، ژانر. |
| موضع - مكان | Place = Locality | پێ جاڵ، شوێن، سەنگەر. |
| موضعي = محلي | Local = Localized | شوێنی: هەرشتێك پەیوەندی بە شوێنەوە هەبێت. |
| موضع تجفيف الزبيب | | مشتاخ. |
| موضوعة | Postulate | بەڵگەویست، دانراوە، دواییەکی ئەندازیارییە بەبێ سەلماندن باوەڕی پێ ئەکرێت. |
| موضة - مبتكرات الموسم | Mode Fashion | مۆدە، جۆری جلو بەرگ بە پێی وەرز. |
| موطن | Habitat = homeland | جێ نزرگە، وولات، نیشتمان، ژینگەی گیانەوەرانو رووەك. |
| موطني | Native | نیشتمانی، جێ نزرگەیی، پەیوەندیی بە گیانداروو رووەکی ناوچەیەکی تایبەتییەوە هەیە، هەروەها سیفەتی مەعدەنێك کە لەگەڵ مەعدەنی تردا یەکتری نەگرتبێت وەکوو زێڕ. |
| موطأ - موطيء | Footing = Foothold | شوێنی پێ، جێگە پێ. |
| موطأ المسحاة - موطيء المسحاة | | ئەسپەرە، پارچە دارێکی کوندارە کلکی بێڵی پیا دەکرێت بۆ ئەوەی قاچی بخرێتە سەر لە کاتی کێڵاندا. |
| موظ = الكة = موس | Moose = elk | مووز، گیاندارێکی کاوێژکەری کەتەیە لە کۆمەڵەی گەوەزن لە ناوچە ساردەکاندا دەژی، سەری لاکێشەییە لە سەری ئێستر ئەچێت، ملی کورتو ئەستورە، ریشی هەیە شاخەکەی لقدارە لەناو دارو درەخت دا دەژی لە باکووری ئەمەریکادا. |
| موظف | Appointed = emploee | فرمانبەر. |
| موعد | Appointed (or) Fixed Time | شوێنێك یان کاتێکی دیاری کراو. |
| موغرة | Steaming machine | کوڵێنەر، دەزگایەکە ئاوی تیا دەکوڵێنرێت بۆ مەبەستی تایبەتی. |
| موفور - اوافر - كثير | Abundant = Plentiful | زۆر، زەبەند، فرە، مشە. |
| موفة | Muff | موف، جۆرێکە لە دەسکێکش بۆ بە گەرمکردنەوەی دەست بەکاردێت. |
| موق | Canthus | (١) بۆڕی فرمێسك، (٢) گۆشەی چاو. |
| موقي | Canthal | هەرشتێك پەیوەندی بە گۆشەی چاوەوە هەبێت. |
| موق | Winged ant | مێروولەی باڵدار. |
| موقف | Attitude | هەڵوێست. |
| موقف | Parking Place | وێستگە، شوێنی وەستان، شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێل . هتد. |
| موقف للنزيف - موقف النزيف - مرقاة - رقؤ | Anthem Orrhagic = Hemostatic | خوێن وەستێنەر. |
| موقد - مدفأة | Stove | سۆپا. |

| | | |
|---|---|---|
| موقد | Chafing dish = FirePlace | وەجاخ، ئاگردان، کوانو، کوانك، کوورە، ئاورگ، بە سووتکە. |
| موقد کوبر | Cowper Stove | ئاگردانی کوپەر، ئاگردانێکە بۆ پەیداکردنی تەوژمێك لە هەوای گەرم بەکاردێت لە پوختەکردنی ئاسندا. |
| موقوف | Stopped = Suspended | وەستێنراو. |
| موقع - مکان | Station = Location = Site | شوێن، جێگە. |
| موقع النظر | | بەرچاو. |
| موقع | Signer | ئیمزاکەر. |
| موقل - نقطة الأوج | Apogee | دوورترین ماوە لە نێوانی زەوی و ئەستێرەیەك. |
| موکایین | Mucaine | مووکایین، دەرمانێکە بۆ چارەسەرکردنی ترشەڵۆکی گەدە بە شێوەی شلە هەیە. |
| موکب | Aprocession = Train of persons | کۆمەڵێك لە کەسان بە سواری یان بە پیادەیی پێکەوە بڕۆن. |
| موکن - حضانة | Raiser = brooder | کولانەیەکی گەرمی دەستکردە بۆ پەروەردەکردنی جووجك. |
| موکنة = عش | Nest | هێلانە. |
| موکیت | Muquette | مۆکێت، هەر رایەخێك ریشاڵی پێوەبێت، وەکوو یەکێك لە جۆرەکانی کومبار. |
| مولد - ولادة | Birth of a child | زایین، لەدایك بوون. |
| مولد ( وقت الولادة) | Birth day | کاتی زایین، کاتی لە دایك بوون. |
| مولد (مکان الولادة) | Birth Place | شوێنی لە دایك بوون. |
| مولد | Half breed | دوو رەگ، مرۆڤی دوورەگ. |
| مولد - مکون | Gen | پاشگرێکە بە مانای پەیداکەر. |
| مولد کهرطیسي | Magneto- generator | دینەمۆی کارۆ موگناتیسی. |
| مولد العظم | Osteogen | ئێسك پەیداکەر، پەیداکەری ئێسك. |
| مولد فان دي غراف | Vande graff generator | دینەمۆی ڤان دی گراف، جۆرێکە لە دینەمۆی کارو ستاتیکی بۆ ئەوە دامەزرێنراوە کە ئەرکی کارەبایی ملیۆنەها ڤۆڵت بدات، دەشێت دینەمۆیەکی ڤان دی گراف کە ووزەکی یەك ملیۆن ئەلیکترۆن ڤۆڵت بێت تیشکی سینی ئەوتۆ پەیدا بکات کە پلێتێکی پۆڵایی بسمێت کە ئەستوورییەکەی (١٢)سم بێت. |
| مولد کهروستاتي | Electrostatic generator | راجع (ڤاندی گراف). |
| مولد المضاد - مولد الأجسام المضادة | Antigen | دژ پەیداکەر، ئەو مادەیەی کە بکرێتە لەشەوە (بە کوتان) دژی خۆی بۆ پەیدا دەبێت. |
| مولد الحرارة | Calorogenie = Pyrogenous | گەرمی پەیداکەر، هەرشتێك گەرمی ی یان وزە پەیدا بکات. |
| مولد کهربائي - داینمو | Generator = dynamo | دینەمۆ، پەیداکەری کارەبا، کارەبا پەیداکەر، ئامرازێکە بۆ گۆڕینی وزەی میکانیکی بە وزەی کارەبا، بە شێوەی تەوژمی بەردەوام یان ئاو بەناو. |
| مولد بثرومبین - بروثرومبین | Thrombogen | ثرومبوجین ، یەکێکە لە کارکەرەکانی وەستاندنی خوێن. |
| مولد الذکورة - مولد صفات الذکر | Androgenic | پەیداکەری رەوشتەکانی نێریی. |
| مولدة | Mid wife | پەیداکەر، داپیرك، مامان. |
| مولدة البیضة | Oogonium | گەرا پەیداکەر، گەرا دروست کەر. |
| مولدة الجذور | Rhizogen | رەنگ پەیداکەر. |
| مولدة الحریر | Sericigenous | ئاوریشم پەیداکەر، هەموو پەپوولەیەك میتۆلکەکەی (کرمەکەی) ئاوریشم دەربدات وەکوو کرمی ئاوریشم. |

| | | |
|---|---|---|
| مولدة الفلين | Phellogen | تەپەدۆر پەیداکەر، ئەو شانەیەی کە تەپەدۆر دروست دەکات لە روەکدا. |
| مولدة الليفين | Fibrinogen | پەیداکەری ریشاڵ. |
| مولد = طبيب مولد | Accoucheur | پزیشکی منداڵ پێهێنەر، ئەو پزیشکەی کە منداڵ لە دایکی جیا دەکاتەوە. |
| مولود - وليد | Child = baby = infant | لەدایك بوو، زاو ، زایە، ساوا، کۆرپە. |
| مولود اخير | Late born | پاشەبەر. |
| موليبدنيوم | Molybdenum | مۆلیبدینیوم، توخمێکی کیمیاگەری یە کانزایی‌یە کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (٩٦)و ژمارەی ا‌ەتۆمی‌یەکەی (٤٢) ە ، کانزایەکی خۆڵەمێشی سپی‌یە لە کرۆم دەچێت، ناوەکەی لە وشەی (مولیبدوس) واتە قورقوشم وەگیراوە، بۆ قایم کردنی پۆلا بەکاردێت بە شێوەی دارشتە، نیشانەکەی (Mo) یە، لە زمانەی رادیۆو دارشتەدا بەکاردێت بە شێوەی پلێتی رەق و لوولەی تۆپ و گوللەو پیشەسازی ئەلیکترۆنی‌یەکاندا. |
| موليبدات | Molybdate | مولیبدات، تۆزێکی رەنگ پرتەقاڵی یە لە کرۆماتی قورقوشم و مولیبدات و گۆگردات پێك هاتووە. |
| موليبدينيت | Molybdenite | مولیبدینایت، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی مولیبدینۆم بە شێوەی دووەم گۆگردیدی مولیبدینۆم رەنگەکەی خۆڵەمێشی بریسکەدارە لە دروست کردنی جۆرێکی تایبەتی لە پۆلا بەکاردێت. |
| موليبدات الباريوم | Barium moly bdate (BaMo o4) | مولیبداتی-باریۆم، تۆزێکی سپی‌یە لە زانستی ئەلیکترۆنیك داو، لە ئامرازی بینایی‌داو، لە بۆیەدا بەکاردێت. |
| موليبدات الامونيوم | Ammonium mdybddate | مولیبداتی- ئامۆنیۆم، تۆزێکی بلووری سپی‌یە، وەکوو کارکەرێکی شی کردنەوە لە دروست کردنی کانزای مولیبدینیومدا بەکاردێت. |
| مولبدات الكادميوم | Cadmium molybdate (Cdmo $O_4$) | مولیبداتی کادیۆم، خۆی یەکە بە شێوەی بلووری زەرد هەیە لە مەیانی ئەلیکترۆنیك و بینایی‌دا (بصریات) بەکاردێت. |
| مولبدات الكوبلت | Cobalt molybdate | کولیبداتی کۆباڵت، تۆزێکی خۆڵەمێشی مەیلەو سەوزە لە تەکنەلۆجیای پەترۆڵدا بەکاردێت. |
| مولبدات الكالسيوم | Calcium molybdate | مورلیبداتی کالیسیۆم، تۆزێکی بلووری سپی‌یە، لە ئامادەکردنی دارشتەی ئاسن و پۆلاو، بلوورەکانی لە مەیانی ئامرازی بینایی و ئەلیکترۆنیکدا بەکاردێت. |
| مولع | Fond of = phil | ئالوودە، کەسێك ئالوودەی شتێك بووبێت. |
| مولع بالحراره | Thermo philic = Thermophil | ئالوودەی گەرمی‌ی، گەرمی خواز. |
| مولع بالدم | Hemophil = hemophilic | ئالوودەی خوێن، خوێن خواز. |
| مولع بالضوء | PhotoPhilic | ئالوودەی رووناکی، رووناکی خواز. |
| مولاس | Molasse | مۆلێس، بەردێکی لمی وردی سەوزە. |
| مولاس | Molasses | دۆشاوی شەکر، مادەیەکی لینجە لە شەکری خاو جیا دەکرێتەوە لەکاتی دروست کردنی شەکردا. |
| مولار - كتلي | Molar | مۆلار، پەیوەندی بە بارستە (کتلە) ی ئەو مادەوە هەیە. |
| مولارية - تركيز جزيئي غرامي | Molarity | مۆلاریتی. |
| مولاليتي - التركيز الجزيئي الغرامي | Molality | پەیتی گەردیی گرامی. |
| مولال - جزيئيغرامي | Molal | مۆلال، پەیوەندی بە کێشی گەردی‌یەوە هەیە لە گرامێکدا. |
| مولينيزي | Molliensia | مۆلینیزیا، ماسی‌یەکی رەنگینە. |

| | | |
|---|---|---|
| مولج - مدخل | Entrance | شوێنی چوونەژوورەوە. |
| مومورديكا - معضوضة | Momordica | مۆمۆریکا، گوڵ خەندەران، ڕووەکێکە لە خەیار دەچێت. |
| مؤلم - موجع | Algesic = algelic | بەئێش، بە ئازار. |
| موم | Wild dill | شیویتە کێویلە. |
| موم الحائك | Weavers reel = Thread holder | دەزوو هەڵگر لە جۆلاییدا. |
| مومسة - بغـي - | | قەحپە، سوزانی، ئافرەتی خراپ. |
| مومس - خليلة | | |
| مومياء - مومياء (حثة محنطة) | Mummy | (١) مۆمنایی، مۆمی کانزایی، جۆرە دەرمانێکە ڕەشە وەکوو قیر وایە مۆمیای پێ ئەکرێت،(٢) لەشێکی مۆمیا کراو، لەشێکی وشکەوەکراوی بە مۆمیا پارێزراو. |
| مومیائیة - مومیة | Mummificatior | مۆمیا کردن. |
| مونتاج - اعداد | Scenert = montage | ئامادەکردن، هەڵبژاردن و ڕێکخستنی ئەو دیمەنانەی کە بە فۆتۆگراف گیراون بۆ شریتی سینەمایی. |
| موننغهيل | Monongahela | مۆنۆنگهیل، جۆرێکە لە ویسکی. |
| مونوكل | Monocle | عەینەکی یەك زەڕەبینی. |
| مونال | Monal | مۆنال، کەوی هیندی، باڵندەیەکی ڕەنگینی جوانە درێژییەکەی (٨) ئینچ دەبێت لە چیاکانی هیمالایادا دەژی. |
| مونولوج | Monologue | مۆنۆلۆج، دیمەنێکە لەسەر شانۆیەك بەیەك ئەکتەر (ممثل) جێ بەجێ دەکرێت. |
| مونتيسيليت | Monticellite | مۆنتیسیلایت، مەعدەنێکە بریتییە لە سلیکاتی کالسیۆم و مەگنیسیۆم، بێ ڕەنگ یان خۆڵەمێشییە. |
| مونردة - استبون | Monarde = Bee Palm = monarda | نەعنای ئەمریکی، گیایەکە گەڵاو گوڵەکەی بڕێکی زۆر لە مادەی ثیمۆلی تیادایە چەند جۆرێکی هەیە. |
| مونستيرة - قشطة هندية | Monstera = Cerlman | قەیماغی هیندی، ڕووەکێکی کەپری ئەمریکییە لە کۆمەڵەی سێوی بن ئەرز، بەرەکەی دەخورێت. |
| مونردة ناسورية - برغموت بري - نعناع الفرس | Wild bergamot = Horse mint | نەعنای ئەسپ، جۆرێکە لە مونارد‌ا، گوڵی سپی یان زەرد یان پەمبەیی یان سوور ئەگرێت،گەڵاکەی بۆن خۆشە لە دروستکردنی عەتردا بەکاردێت، لە گوڵەکەی ڕۆنێك دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت، گەڵا وشکەکانی وەکوو چایی بەکاردێت پێی دەووترێت چای پەنسلڤانیا. |
| مونوغرام | Monogram | خەت، نیشانەی ناوی مرۆڤێکە بریتییە لە پیتە یەکەمەکانی ناوەکەی وەکوو تۆڕێك دەنوسرێت وەکوو لە خەتی پشتی پارەی مەعدەندا. |
| مونومر - أحادي الجزئي | Monomer | مۆنۆمێر، مادەیەکە لە گەردی (جزئی) تاك پێك هاتووە، بە یەکترییەوە نەبەستراون، هەروەها بە شێوەیەکی تایبەتی بریتییە لە چەند گەردێك لە یەك جۆر دەشێت لەگەڵ یەکتری یەك بگرن و گەردی درێژی زنجیرەیی دروست بکەن پێیان دەوترێت: پەلەمەرەکان وەکوو (پۆلی ئیثیلین). |
| مونازيت | Monazite (Ce,la,Yt) $Tho_2$ and $slo_2$ | مۆنازایت، مەعدەنێکە بریتییە لە فۆسفاتی سیریۆم و لانثانۆم و ثوریۆم، ڕەنگەکەی مەیلەو زەرد یان قاوەیی مەیلەو سوورە هەندێك جاریش مەیلەو سەوزە، کەرەسەیەکی خاوە بۆ کانزای ثوریۆم و سیریۆم، لەی مۆنازایت لە مەیانی ئابووریدا بەکاردێت، لە دروستکردنی چرای گازدا بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| مونتمور يللونايت | Mont morillonite | مۆنتمۆریلونایت، کۆمەڵە کەرەسەیەکی خاوی واتە مەعدەنی قوڕییە کە خرایە ئاوەوە هەڵدەئاوسێت شێوەیەکە لە گڵ (قوڕ) پێکهاتی کیمیایی یەکەی بریتییە لە $AL_2O_3 . 4SiO_2 . H_2O$ یەکێکە لە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی بێنتۆنایت (bentonite) کە ئەمیش توانای هەڵ ئاوسانی هەیە، قاڵبی داڕشتەی لێ دروست دەکرێت. |
| موه = استسقاء | Hydrops | ئاوبەنگ، ئاوبەند. |
| موهبة | Gratuity = talent | بەهرە، بلیمەتی. |
| موهوب | Granted = bestowed = talented | بەهرەمەند، بلیمەت. |
| موهر | Mohur | مۆهەر،دراوێکی زێڕینی هیندیی و فارسی کۆنە. |
| موه الدم = تمية الدم | Diarhemia | بەئاو بوونی خوێن. |
| موهير | Mohair | (١) مەرەز، بزنی تورکیا تووکەکەی نەرم وە بە نرخە، (٢) جۆرێکە لە قوماشی بە نرخ لە مووی بزنە مەرەز دەچنرێت. |
| موهم = مزيف | Spurious | ساختە، قەڵپ، درۆ. |
| مويلح | Brackish = saltish | کەم سوێر، ئاوێك کەمێك سوێربێت. |
| ميالجيا | Myalgia | ئێشی ماسولکە، ماسولکە ئێشە. |
| مياسرة | Sinistrose | چەپگرتن، چەپلەریی. |
| مياسر = ايسر الدوران | Levorotator | خولانەوەی چەپی، چەپە خولانەوە، چەپگرتوو. |
| ميالين | Myelin | میالین، مادەیەکی سپی نەرمە، لە پیو دەچێت دەزووەکانی دەماری جوڵێنەرو هەست دادەپۆشێت. |
| مياكيس | Miacis | میاکیس، جۆرە گیاندارێکی قڕ تێکەوتووە، زاناکان ئەڵێن کەوا سەرەتای (اصل) سەگ وورچ بووە. |
| مياه متساقطة | Water Fall | سولاو، تێژەنگ. |
| مياه كبريتية | Sulkurous water | ئاوی گۆگردین، گەراو، ئاوی گۆگرداوی. |
| مياه حامضية | Acidic water | ترشاو، ئاوە ترشەکان. |
| مياه ملحية | Salt water | سوێراو، ئاوی سوێر، شۆراو. |
| مياه جوفية | Under ground waters | ژێر زەوی، ئاوی ژێرزەمین، کارێز. |
| مياه اقليمية | Regional waters = Territorial water | ئاوی هەرێمی، هەرێماو، ئاوی هەرێمییەکان، مەودای ئەو ئاوەی کە لە کەناری دەریادایەو لەژێر دەستەڵاتی هەرێمی ئەو وڵاتەدایە کە بە سەریدا دەڕوانێت. |
| مياه معدنية | Mineral waters | ئاوە کانزاییەکان، گەراو، جۆرە کانییەکە مادەی کانزایی تیادایەو مەلەکردن تیادا بۆ نەخۆشی پێست باشە. |
| مياه قذرة | Dirty waters | چڵکاو. |
| مياه راكدة = مياه اسنة | Stagnant water | ئاڤ گەنی، ئاوی وەستاوو بۆگەن. |
| ميئينية = ام اربع و اربعين | Scolopendra | چلو چوار پێ، سەدپێ، گیاندارێکە لە لقی جومگەدارەکانە، لەشی لە چەند پارچەیەك پێك هاتووە، هەر پارچەیەك جووتێك پەلی پێوەیە، بەسەر زەویدا دەخشێت. |
| ميبة | Juice of The Quince | ئاوی بەهێ، ئاڤابیها. |
| ميبريدين | Meperidine | مێپریدین، دەرمانێکی بێ هۆشکەرە. |

| | | |
|---|---|---|
| ميت | Dead | مردوو، مری. |
| ميتازوا - متزويات | Metazoa | گیانداره فرەخانەکان، گیانداره ئاوێتەکان، واتـه ئـەو گیاندارانـەی کـه لەشیان له ژمارەیەکی زۆر له خانه پێك هاتووه، وەکوو گیانداره شیردەرو باڵندەو خشۆکو ماسیو کرم. |
| ميتافيزك = ميتافيزيقا = ما وراء الطبيعة | Metaphysics | میتافیزیك، زانستی ئەودیوی ماده یان سروشت، لقێکه له فەلسەفه زانست بوون (علم الوجود) و زانستی بنەڕەتو پێکهاتی گەردوون دەگرێتەوه یان به واتایەکی تر بریتی‌یه له فەلسەفه به هەموو لقه قورسو ئاڵۆزەکانی‌یەوە. |
| ميتافوسفات | Metaphosphate | میتافۆسفات |
| ميتافوسفات البريليوم | Beryllium metaphos phate = Be $(Po_3)_2$ | میتافۆسفاتی بریلیوم، تۆزێکی سپی کونیلەداره له جۆرێکی تایبەتی له سیرامیکیدا بەکاردەهێنرێت. |
| ميتافوسفات الباريوم | Barium metaphosphate = ( $Pa(Po_3)_2$ | میتافۆسفاتی باریۆم، تۆزێکی سپی‌یه ژەهرینه له دروست کردنی شوشەو پۆرسالیندا بەکاردێت. |
| ميتابروتين | Metaprotein | میتاپرۆتین، مادەیەکه له پرۆتین وەردەگیرێت بەکاری ماده ترشەکان یان تفتەکان. |
| ميتا سليكات الكالسيوم | Calcium metasilicate | میتا سلیکاتی کالسیۆم، تۆزێکی سپی‌یه. |
| ميتابوليزم - ايض | Metabolism | کرداره زیندەگی‌یەکان، ئەو کردارانەی که پەیوەندی‌یان به دروست کردنو لەناوبردنی پرۆتۆپلازمەوه هەیه. |
| ميتابازيت | Metabasite | میتبـازایت، جـۆره کەڤرێکـه کەرمـسـەی خـاوی بـازڵت (BASALT) و دۆلیرایتی (dolerite) تیادایه. |
| ميتاكوندريا | Mitochondria | میتاکۆندریا،مایتۆ کۆندریـا، بریتی‌یـه لـه تـەنی خـڕ یـان چیلکـەیی یـان شریتی به باشی بۆیه دەکرێت، به شێوەیەکی فراوان لـه خانەکانی جگەرو گورچیلـەدا هەیـه، ئـەنزیمێکی زۆریـان تیادایـه بـه تایبـەتی ئـەنزیمی ئۆکسێنەر که به هۆیەوه خانەکان هەناسه دەدەن، میتا کۆندریا گرنگترین بەشی خانەی لەشی زیندەوەره ، بریتی‌یه له وێستگەیەکی پەیدا کردنی وزە. |
| ميتالورجيا - علم المعادن | Metallurgy | زانستی مەعدەنەکان، مەعدەنزانی، زانستێکه باسی دەرهێنانو سروشتی مەعدەنەکان دەکات. |
| معدغرافيا | Metallography | زانستی خوێندنی پێکهاتنی کانزاو دارشتەو پشکنینیان به میکرۆسکۆپ. |
| ميتا ثلازم | Metaplasm | میتـاپلازم، مـادەی مـردوو لـه خانـەی زینـدەوەردا وەکـوو دەنکۆڵـەکانی نیشاستەو هیمۆگلۆبین. |
| ميتادون | Methadon | میتادۆن، مادەیەکی کیمیایی سڕکەره دەدرێت بەو کەسانەی که بەنگ دەکێشن. |
| ميتاموسيل | Metamucil | میتامووسیل، دەرمانێکه بۆ چارەکردنی قەبزیی به شێوەی شله بەکاردێت. |
| ميتاقصديريك | Metastannic | میتاستانیك، ئاوێتەیەکی تەنەکەیه (قصدیر). |
| ميتول | Metol | میتۆل، مادەیەکی دەرخەره له وێنەگرتنی فۆتۆگرافیدا بەکاردێت. |
| ميتوبون | Metopon | میتۆپۆن، دەرمانێکی سڕکەره له مۆرفین دەردەهێنرێت. |
| ميترازول | Metrazol | میترازۆل، دەرمانێکه بۆ گورج کردنەوەی دڵو سی‌یەکان. |
| ميتيورولوجيا - علم الأرصاد الجوية | Meteorology | زانستی کەش، کەشزانی. |
| ميتم - ملجأ الأيتام | Orphanage | هەتیوخانه. |
| ميتدة - ميطدة | Mallet | چەکوشی تەخته، ئامرازێکه له تەخته یان ئاسن سنگی پێ دائەکوترێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ميتوبس | Spiden of field | جاڵجاڵۆكەی دەغڵو دان. |
| ميتوبوسيرس مقرن | Metopoceros | میتۆپۆسیرۆس، گیاندارێكی خشۆكی شاخ دارە. |
| ميثان - غاز المستنقعات | Methane = Marsh gas | میثان، گازی زەلكاوەكان، گازێكی هایدرۆكاربۆنی یە زوو ئەسووتێ لە زەلكاوو بیری نەوتەوە دێتە دەرەوە، لە ئەتۆمێك كاربۆنو چوار ئەتۆم هایدرۆجین پێك هاتووە، بۆ سوتاندن دەست دەدات. |
| ميثانول - كحول مثيلي | Methanol = Methy alcohol | میثانۆل، ئەلكوولی مەثیلی، سپیرتۆ، سپیرتۆی تەختە، شلەیەكی بێ رەنگی ژەهرە زووگڕ ئەگرێت. |
| وعد - ميثاق - وعد | Promice | بەڵێن. |
| ميثسال | Meth Sal | میثسال، دەرمانێكە بۆ كەمكردنەوەی ئێشو ئازاری رۆماتیزمەو دەمار بەشێوەی مەڵحەمە. |
| ميثيلين | Methylene | مە ثیلین رەگێكی كیمیایی هایدروكاربۆنی یە، هاوهێزی یەكەی (٢) ە. |
| ميثادون | Methadon | میثادۆن، دەرمانێكی بێ هۆشكەرە. |
| ميثيلامين | Methylamine | میـثیلامین گازێكە گڕ دەگرێتو دەتەقێت. |
| ميثيلايت | Methylate | میثیلایت، ئاوێتەیەكە لە میثانۆل دەردەهێنرێت. |
| ميثيلال | Methylal | میثیلال ، دەرمانێكی شلەیە وەكوو خەوێنەر بەكاردێت. |
| ميثيونين | Methionine | میثیۆنین، ترشێكی ئەمینی یە لە هەندێك پرۆتینی وەكوو زەردێنەی هێلكەو هەوێندا هەیە. |
| ميثنامين | Methenamine | میثینامین، مادەیەكە ترشی میزی پێ دەتوێنرێتەوە. |
| ميثودولوجيا - علم المنهج | Methodology | میثۆدۆلۆجی، زانستی بەرنامە. |
| ميج - ميج طائر - ميك طائر - سمك طيار | Flying Fish = Flying gurnard | ماسی یە فڕندە ، ماسی میك، ماسی یەكی دەریایی فڕندەیی رەگینە، سەری دڕكاوی یە، دوو پەڕەكەی گەورەی باڵداری هەیە یارمەتی دەدەن بۆ رۆیشتن یان بەرزبوونەوە (واتە فڕین) بەسەر ئاوەكەدا لە بەرزایی مەترێكدا بۆ ماوەی نیو خولەك. |
| ميجة | Pider Crab | قرژاڵی جاڵجاڵۆكەیی، جاڵجاڵۆكەی دەریا، جۆرە قرژاڵێكە ئەخورێت. |
| ميجاتيريوم | Megatherium | میگاثیریەم، گیاندارێكی شیردەری كەتەی ددانـدار بووە لە دەشتەكانی ئەرجەنتیندا ژیاوە. |
| ميد - تمايل | Oscillation | لەرینەوە. |
| ميد | Mead = metheglin | مید، جۆرێكە لە شەراب لە هەنگوینو ئاوی جۆو هەوێن ئامادە دەكرێت. |
| ميدوك | Medoc | میدۆك، جۆرێكە لە شەراب، لە ناوچەی بۆردۆدا دروست دەكرێت. |
| ميداس = تمران | Tamaran = midas | تاماران، میداس، جۆرە مەیمونێكە لە كۆمەڵەی مەیمونە ورچی یەكان بچكۆلەو جوانو تیسكە. |
| ميدس | Fluviometer | دەزگایەكە بۆ پێوانی ئاوی رووبارەكانو رادەی لێژبوونەوەیان. |
| ميدان | Aplain | مەیان، كایە، گۆرەپان. |
| ميدان سباق السيارات | Motor dome | مەیانی پێشبڕكێ بە ئۆتۆمبیلو پایسكل. |
| ميدان السباقة - حلبة السباق | Race Course | رایسز، مەیانی پێشبڕكێی ئەسپ. |
| ميدان مصارعة الديكة | Cock Pit | مەیانی شەڕە كەڵەشێر. |
| ميدع المزارعين | Overall | جلو بەرگی ئیش، جلو بەرگی كێڵگە یان كارگە. |
| ميداليون - مرصع | Locket = medal | مەدالیا، نقێم. |

| | | |
|---|---|---|
| ميداليون | Medalion | مەداليۆن، مەداليايەكە نەخشى بەرزى لە سەرە. |
| ميدية - بلح البحر | Mussel = mytelus | خورماى دەريا، جۆرە گياندارێكى ناوى بىَ برِبرِەيە سەدەف هەيە، جۆرێكە لە گوێچكە ماسى ئەخورێت شێوەى لەيەكەكەى لە خورما ئەچێت. |
| ميدوزا - قنديل البحر | Medusa = Jelly Fish | ميدۆزا، سى دەريا، چراى دەريا، ولۆلەى دەريا، گەزمەندەى دەريا، جۆرە گياندارێكى بۆش ريخۆلەى دەريايى نەرمى لينجە هەندێك ئەندامى هەيە وەكوو چزوو وايە بە گياندارى ترەوە ئەنووسێت و ئازارى ئەدات، شێوەكەى لە زەنگۆلە يان تاسە ئەچێت. |
| مير | Sight | جۆرە راستەيەكى رەنووس كراوە بۆ دۆزينەوەى بەرزايى بەكاردێت. |
| ميرابلة | Mirabelle plum = Syrian plum | هەلۆژەى ميرابێلى، بەرى جۆرێكە لە هەلۆژە لە ميسردا زۆرە. |
| ميركسيلون = شجر البلسم | Myroxylon | مايرۆكسيلۆن، درەختێكى ناوچەگەرمەكان لە قەدو لقەكەى بە برينداركردن شيراوگێكى رێسينى بەلسەمى دەردەهێنرێت بۆ مەبەستى پزيشكى بەكاردێت. |
| ميريقارية - طرفاوية | Myricaria | دەوەنێكە لە كۆمەڵەى دارگەز. |
| ميركروكروم | Mercurochrome | مێركرۆكرۆم، راجع (ميكروكروم). |
| ميريقة - شمعية | Bay berry = Myrica | مايريكا، دەوەنێكى بۆنخۆشە لە كۆمەڵەى مۆمىيەكان بەرەكەى لە ترێ دەچێت بە مۆم داپۆشراوە. |
| ميروزيت | Merozoite | ميرۆزۆيت، بارێكە لە ژيانى هەندێك گياندارى سەرەتاييدا، وەكوو لە مشەخۆرى مەلاريادا. |
| ميراث - تركة | Heritage = Succe ssion | ميراتى، بەجێماو، بۆ ماوە، ميرات، لە پاش بەجێماو. |
| ميرياد | Myriad | مايرياد، دەهەزار. |
| ميريامتر | Myriameter | ميريامەتر، ١٠ كيلۆمەترە، دە هەزار مەترە. |
| ميراسيديوم | Miracidium | ميراسيديۆم، سەرە مێكوتەيەكى برژانگ دارە، لە گەراى كرمى جگەرەوە دێتە دەرەوە. |
| مرسين - قتم - مرسين | Myrsine = Myrtle | دەوەنێكى ناوچە گەرمەكانە لە مۆرد ئەچێت بەرەكەى بچووكە ئەخورێت. |
| ميرة | Provisions | پێ بژێيو، ئازووقە، زەخيرە، زەخيرەى يەدەك. |
| ميركبتان - كحول كبريتي | Mercaptan | مێركەپتان، ئاوێتەيەكى ئەندامىيە كۆمەڵەى گۆگردو هايدرۆجينى تيادايە كە راستەوخۆ لەگەڵ گەرديلەى كاربۆن يەكى گرتووە. |
| ميروكوديان | | ميرۆكۆديا، جۆرە رووەكێكە، مێروو لە قەدەكەى كون دەكات و تيايدا ئەژى. |
| ميروتون | Miroton | ميرۆتۆن، دەرمانێكە بۆ چارەكردنى كەم توانايى دڵ. |
| ميراندا | Miranda | ميراندا، پاشكۆى هەسارەى ئەو رانووسە دوورى لە هەسارەكەيەوە (٨٣ x ١٠ ^٣^) ميلە، تيرەكەى (٢٥٠) ميلە زانا كوپير لە ساڵى ١٩٤٨دا دۆزيەوە. |
| ميز - ميز غشائي - ديلزة | Dialysis | دياليسيس، جياكردنەوەى مادە نيمچە ملكان لەو مادانەى تر كە دەشێن بۆ توانەوە بە بەكارهێنانى پەردەيەكى جياكەرەوە. |
| ميزان - مقياس | Libra = Scale = Balance = Criterion = weighing machine | تەرازوو، تەرازى، پێوەر. |
| ميزان - ميزان اعتيادي | Libra | تەرازوو، برجى تەرازوو. |
| ميزان الأرتفاع - علسط - مقياس الأرتفاع | Altimeter | بەرزايى پێو، دەزگايەكە بۆ دەست نيشان كردنى بەرزى شوێنێك لە رووى دەرياوە. |
| ميزان الرطوبة - مرطاب | Hygrometer | شێ پێو، ئامرازێكە بۆ پێوانى رادەى شێ لە هەوادا. |

| | | |
|---|---|---|
| ميزان التسوية = ميزان البناء - فادن - مسواة المساح | Level | شاوڵى ئاسۆيى، تەرازووى بەنايى، تەرازووى تەختىى. |
| ميزان مائي - ميزان التسوية | Spirit level = level | تەرازووى ئاويى، بۆڕییەکی شووشەیە بڵقێك هەوای تیادایە لە شلەیەکدا بۆ دڵنیابوون لە تەختی و ڕێکی ڕووی شتومەك بەکاردێت. |
| ميزان اللي | | تەرازووى خوارکردنەوە. |
| ميزان (مدرج) كلفن لدرجات الحرارة | Kelvin temperature scale | تەرازووى کێلڤن، تەرازوویەکە (پێوانەیەکە) بۆ پلەی گەرمی، کەمترین پلەی گەرمی تیایدا سفری سەدییە، پێشی دەوترێت تەرازووی گەرمی پەتی، کورتەکەشی (ك=K)ە. |
| ميزان حساس | Sensitive balance | تەرازووى هەست کەر، تەرازووى هەستیار، جۆرە تەرازوویەکە شتی زۆر ورد ئەکێشێت. |
| ميزان دقيق | Micro balance | تەرازووى ورد، جۆرە تەرازوویەکە، توانای پێوانی کێشی شتومەکی وردی هەیە هەتا ڕادەی١٠$^{-٦}$ گرام. |
| ميزان زنبركي | Spring balance | تەرازووى زەمبەلەکی. |
| ميزان ضبط الاستواء | | تەرازووى پێوانی ڕێکی، تەرازووى بەنایی. |
| ميزان الحليب - مشخاب - مقياس السمن | Lactometer butyrometer | چەوریی پێو، دەزگایەکە بۆ دەرخستنی ڕێژەی چەوری و ڕۆن لە شیردا. |
| ميزان تجاري | Balance Trade | تەرازووى بازرگانی، بودجەی بازرگانی. |
| ميزان اللبن | Milk Scale | تەرازووى شیر، تەرازووى پێوانی کێشی شیر. |
| ميزان قباني | Steelyard | قەپان . |
| ميزان الحراره - مقياس الحراره | Thermometer | گەرمی پێو، تەرمۆمەتر. |
| ميزان الهواء - مقياس الهواء - بارومتر | Barometer | بارۆمیتەر، بانوورێن،، قەپانی با، پەستان پێو. |
| ميزان الحموضة - مقياس الحموضة | Acidimeter | ترشی پێو، ئامرازێکە بۆ زانینی بڕی ترشی شلەکان. |
| ميزان العصير - مقياس العصير | Mustimeter | شیلە پێو، ئامرازێکە بۆ پێوانی بڕی شەکر لە شیلە یان ئاووك دا. |
| ميزان الكحول - مقياس الكحول - مكحال | Alcoholometer | ئەلکهول پێو |
| ميزان المطر - مقياس المطر - مغياث | Pluviometer | باران پێو . |
| ميزان المشروبات - مقياس المشروبات - مشراب | Liquometer = Liquid measure | مەی پێو، دەزگایەکە بۆ پێوانی ڕێژەی ئەلکهول لە مەیدا. |
| ميزان مسجل | recording balance | تەرازووى تۆمارکەر. |
| ميزانية | Budget | بۆدجە، بووجە. |
| ميزر - مازر | Maser | ماسەر، میزەر، ئامرازێکە بۆ گەورەکردنی پرتەی (نبضة) کارەبایی بە ڕێگەی دەرپەڕاندن و هاندانی تیشك، واتە گەورەکردنی شەپۆلی بچووك، بە دەرپەڕاندنی تیشکی چالاك، ناوی میزەر لەم ڕستەیەوە هاتووە: Micro wave Amplification by . |
| ميزر | Mazer | تەشی، تاسەیەکی گەورەیە لە تەختە دروست دەکرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| میزاب = مزراب = مسیل | Groove = gutter = nozzle | ئاوەڕۆ، جوڕنە، پلووسك، شرك، جرونك. |
| میزاء - مسددة | Collimator | كۆلیماتۆر، هاوتەریب كەری تیشكەكان: ئامرازی هاوتەریب كەری رووناكی لە تەلیسكۆپدا. |
| میزو سفیر | Mesosphere | میزۆسفێر، چینێكە لە بەرگی هەوا (كەش) دەكەوێتە سەروو ئایونۆ سفیرەوە، نزیكەی (٢٥٠) میل لە سەروو رووی زەوی‌یەوە بەرزە. |
| میزودورم | Mesoderm | میزودێرم، چینی ناوەڕاستی دیواری لەشی گیاندار. |
| میزوغلیا - هلام متوسط | Mesoglea | میزوگلیا، چینی ناوەڕاستی دیواری پێستی هەندێك گیاندار وەكوو ئیسفەنج، مادەیەكی لینجە. |
| میزولیت | Mesolite | میزولایت، مەعدەنێكە بریتی‌یە لە سلیكاتی سۆدیۆم‌و كالسیۆم‌و ئەلەمنیومی ئاویی بێ رەنگ یان سپی‌و رۆشنە. |
| میزولیتي | Mesolithic | میزۆلیتی، پەیوەندی بە سەدەی بەردینی ناوەڕاستەوە هەیە. |
| میزم | Miasma | میازما، هەڵمێكی بۆگەنە لە زەلكاوەكانەوە دەردەپەڕێت. |
| میز نشیم | Mesenchyme | میزنشیم، چینی ناوەڕاست. |
| میزون باي - بایمیزون | Pi meson | پای میزۆن، میزۆنێكە بارستەكەی (٢٧٠) جار لە هی ئەلیكترۆن زیاترە. |
| میزون - میزوترون | Mesotron = Meson | میزۆن، تەنێكی بچووكی بنەڕەتی‌یە لە ناوكی مادەدا هەندێكیان بارگەی كارەبایی پۆزێتیڤ هەندێكیان نیگەتیڤ هەیەو هەندێكیان بێ بارگەن، تەنۆكەیەكە بارستەكەی لە نێوان پرۆتۆن‌و ئەلیكترۆن دایە، بارستەی میزۆنی قورس دەكاتە (٢٧٣) ئەوەندەی ئەلكترۆن. |
| میزوزوي - عصر حجري أوسط | Mezozoic | میزۆزۆیك، بەشێكە لە وەختی جیۆلۆجی، دێرینی ژیانی ناوەڕاست. |
| میس | Swinging = Swaying | لەنجەولار كردن. |
| میس | Mace | مەیس، بەهاراتێكە لە توێكڵی دیوی دەرەوەی گوێز بۆ (جوزبوا) دروست دەكرێت. |
| میسة = میس - نشم ابیض | Lote tree = Nettle tree = Hack berry = Celtis = hackle berry | تاووك، درەختێكی هەمیشە سەوزە، نزیكەی (١٧) مەتر بەرز ئەبێتەوە گەڵاكەی ددان دارە، زمانەیەكی درێژی پێوەیە، گوڵەكەی سەوزە، بەرەكەی لە ترێ ئەچێت وردە تامەكەی شیرینە، دەنكێكی رەقی تیادایە، تەختەكەی قایمە، رەگەكەی رەنگێكی زەردی لێ دەردەهێنرێت، بەرەكەی لە فاسولیای سەوز ئەچێت، شیلەكەی جۆرە خواردنەوەیەكی لێ دروست دەكرێت، هەروەها بەرەكەی بۆ ئالیك بەكار ئەهێنرێت، هەر چەندە ئەخورێت بەڵام تامەكەی ناخۆشە. |
| میسیتلین | Mesitylene | میسیتێلین، مادەیەكی هایدرۆكاربۆنی چەورە. |
| میسیلین | Messaline | میسلین، قوماشێكی ئاوریشمی تەنكە. |
| میسة - هضبة | Mesa | قۆپی، زەوی‌یەكی بەرز سەرەكەی تەخت بێت دامێنەكانی لێژبن. |
| میسترال | Mistral | میسترال، بایەكی باكووری بەهێزی ساردی وشكە لە فەرەنسەدا هەڵدەكات. |
| میسان القمر | Libration | لارەولاری، مانگ لە جوولە رواڵەتی‌یەكەیدا كاتێك كە بە دەوری زەویدا دەسوڕێتەوە. |
| میسم - مكواة | Cautery | ئامرازی داخ كردن. |
| میسم النبات - سمة | Stigma | كۆسپی رووەك، بەشی سەرەوەی نێركی گوڵ، پێشوازی لە تۆوی هەڵاڵە دەكات. |

| | | |
|---|---|---|
| ميسور | Easy | ئاسان. |
| ميسر، قمار | Gambling | قومار. |
| ميسرة | Left side | لای چەپ. |
| ميشار | Pilot hand Saw | مشارێکی بچووکە ددانەکای جووتن بۆ برینەوەی لقی درەخت. |
| ميط | Draw back | دوورکەوتنەوە. |
| ميطدة | Iron dam = rammer | (١) موورەدار، کە بناغەو دیواری پێ قایم ئەکرێت.<br>(٢) دەقاقە، بۆ کوتاندنەوەی زەوی. |
| ميطان - جبهل | Michan | مانگا کێوی. |
| ميع | Liquidity = Fluidity | شل بوونەوە، توانەوەی شتێکی رەق یان شلەیەکی تونگ. |
| ميعة - شرخ - ريعان - عنفوان | Prime | تاف. |
| ميعة الشباب | Prime of youth | تاڤ لاویی. |
| ميعة | Benzoin = storax | زەمقێکە، لە درەختی (ستیراکس) دەردەهێنرێت بۆ جێگیرکردنی عەتر بەکاردێت. |
| يعة - لبني - لبني مسك - استرك - اصطرك | Storax = Styrax Benzoin | (١) دەوەنێکە گەڵاکەی هێلکەییە گوڵەکەی زەردە جۆرە جەوییەکەی لێ دەردەهێنرێت.<br>(٢) جەوی، زەمقێکی بۆن خۆشە بە شێوەی بخورد بەکاردێت هەروەها بۆ دروست کردنی عەترو مەبەستی پزیشکی. |
| ميعة سائلة | Liquid ambar = Sweet gum | عەبەری شل، شلەیەکی بەلسەمی بۆنخۆشە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت، درەختێکی ئەمریکی دەری دەدات. |
| ميعاد | Declay | کاتێکی دیارکراو. |
| ميغا - ميغ | Meg = mega | پێشگرێکە بە مانای گەورە یان ملیۆن. |
| ميغا اوم | Megohm | میگائۆم، ملیۆنێك ئۆم. |
| ميغا سايكل - ميجا سايكل | Mega cycle | میگا سایکل، ملیۆنێك خول لە چرکەیەکدا، کورتەکەی (M C). |
| ميغامتر - ميكامتر | Mega meter | میگامەتر، یەك ملیۆن مەتر. |
| ميغاطن - ميكا - ميجاطن | Mega ton | میگاتۆن، ملیۆن تەن، هێزێکی تەقینەوەیە یەکسانە بە تەقینەوەی یەك ملیۆن تەن لە مادەی ترای نیترۆ تۆلۆوین. |
| مغادابن | Mega dyne | میگادایِن، یەك ملیۆن داین. |
| ميغافارادای | Mega faraday | میگافارادای، یەك ملیۆن فارادای. |
| ميغافولت | Megavolt | میگاڤۆڵت، یەك ملیۆن ڤۆڵت. |
| ميغاواط | Mega watt | میگاوات، ملیۆنێك وات. |
| ميقار | Productive tree | درەختێك کە بەری زۆربێت. |
| ميت | Chrono meter | کرۆنۆمەتر، ئامرازێکە زۆر بە وردی کات ئەپێوێت. |
| ميك | | جۆرە فرۆکەیەکە. |
| ميك طائر - ميج طائر | Flying gurnard | میکی فڕندە، ماسییەکی دەریایی فڕندەی رەنگینەسەری ئرکاوییە، دوو پەرەکەی گەورەی باڵداری هەیە یارمەتی دەدەن بۆ رۆیشتن بەسەر ئاودا یان بەرز بوونەوە(واتە فڕین) بەسەر ئاوەکەدا لە بەرزایی مەترێکدا بۆ ماوەی نیو خولەك. |

| | | |
|---|---|---|
| منكانيكا - ميكانيك - علم الحيل | Mechanics | لقێكه لـه زانسـتی فيزيـا، باسـی وزەو هـێزو شـوێنكارەكانيان بەسـەر تەنەكەكاندا، دەكات هەروەها كارپێكردنی ئەم زانستە لە دروست كردنو تيش پێكردنی مەكينەدا ، ئەكرێت بە دوو بەشەوە:<br>(١) ستاتيك، خوێندنی لەنگەر گرتنو وەستانی تەنەكان.<br>(٢) ديناميك، خوێندنی جوولانەوەی تەنەكان. |
| ميكانيكا موجية - ميكانيك موجي | Wave mechanics | ميكانيكی شـەپۆلی، تيۆرييەكـە دەلێـت كـەوا ئەليكترۆنـەكان رەوشـتی شەپۆلی يان هەيە. |
| ميكانيكي | Machinist = mechanican | ميكانيكی، كرێكارێك كە مەكينە (يان ئامراز) چاك بكاتەوە يان دروستی بكات يان ئيشی پێ بكات. |
| ميكانيكيا - اليا | Mechanically | ميكانيكێتی. |
| ميكانيكا سماويه | Celestial mechanics | ميكانيكای ئاسمانی، لقێكە لە زانستی ميكانيك بۆ دۆزينـەوەی شـوێنو جوولەی تەنە ئاسمانييەكان بەكاردێت. |
| ميكانيكا زراعية | Agricultural mechanics | ميكانيكی كشتوكاڵی، بەكارهێنانی ميكانيك لە بواری كشتوكاڵيدا. |
| ميكرو | micro | پێشگرێكە بە مانای مايكرۆ، ميكرۆ، يەك بەش لە مليۆنێك بەش. |
| ميكروسكوب - مجهر | Microscope | ميكرۆسكۆب، وردەبين، زەرەبين، ئامرازی گەورەبوونی شتی زۆر بچووك. |
| ميكروسكوب الكتروني | Electron Microscope | ميكرۆسـكۆپی ئەلەكترۆنی، جۆرێكـە لـە ميكرۆسـكۆ ئەلـەكترۆنی تيـا بـەكار ئەهێنرێت بۆ مەبەستی رووناك كردنەوە چونكە درێژی شەپۆلەكەی كورت ترە وەك لە هـی رووناكی ئاسايی، بـۆ بينينی تـەنی زۆر بچووك، وەكوو ڤايرەس بەكاردێت وێنەی تەنەكە لەسەر پەردەيەكی تايبەتی پيشان دەدات. |
| ميكروسـكوب فوقـي - ميكروسكوب دقيق | Ulter Microscope | ئەلترامیكرۆسـكۆپ، ميكرۆسـكۆپی تيژبـين، جـۆرە ميكرۆسـكۆپێكە بـۆ بينينی تەنی يەكجار بچووك بەكار ئەهێنرێ وەكوو دەنكۆڵەی گيراوەی مل. |
| ميكروسكوب | Microscopium | ميكرۆسكۆب، كۆمەڵە ئەستێرەيەكە. |
| ميكرو سپيكترو سكوب | Microspectroscope | ميكرۆ سپيكترۆسكۆپ، دووربينێكی شەبەنگیيە كە لەسەر ميكرۆسكۆپ دامەزرێنراوە. |
| ميكروسكوب بسيط | Simplemicroscope | ميكرۆسكۆپی ساكار، دەزگايەكی بينايیيـە بـۆ وێنەيـەكی زۆر گـەورە بـۆ تەنە بچووكەكان پيشان دەدات ميكرۆسكۆپی ساكار يەك زەرەبين يـان يـەك كۆمەڵە زەرەبينی تيادايە. |
| ميكروسكوب مركب | Compound microscope | ميكرۆسكۆپی ئاوێتە، دوو زەرەبين يـان دوو كۆمەڵـە زەرەبيـنی تيـا دايـە، زەرەبينی يەكـەم پـێ‌ی دەوترێت زەرەبينی چاوی، زەرەبينـی دووەم پـێ‌ی دەوترێت زەرەبينی شت ئەم جۆرە ميكرۆسـكۆپە (١٥٠٠) جـار شـت گـەورە دەكات. |
| ميكرومتر | Micrometer | ميكرۆمەتر، ئامرازێكە بۆ پێوانی گۆشەی زۆر بچـووك- ١/١/٠٠٠/٠٠٠ م پێوەری شتو مادەی زۆر ورد. |
| ميكرو ثانية | Microsecond | ميكرۆچركە، بەشێك لە مليۆن بەشی چركەيەك. |
| ميكرو ميكرون | Micromicron | ميكرۆميكرۆن، بەشێكە لە مليۆن بەشی ميكرۆن. |
| ميكرو فلم - فليم | Microfilm | مايكرۆفليم، فليمۆكە، فليمێكە وێنەی فۆتۆگرافی بچووكی لە لاپەرەی كتێب تيادايە. |
| ميكروسوم | Microsome | مايكرۆسۆم، دەنكۆڵەيەكە لە پرۆتۆپلازمـی خانـەكانی گيـاندارو رووەكـدا هەيە. |

| | | |
|---|---|---|
| ميكروفون | Microphone | مايكرۆفۆن، دەزگايەكە كە دەنگى دەكەوێتە سەر لەرەى ئەوتۆ پەيدا دەكات كە لە لەرەى دەنگ دەچێت بۆ نێرەرى (مرسل) تەلەفۆن‌و گەورەكردن‌و تۆماركردنى دەنگ بەكاردێت، شەپۆلى دەنگ دەگۆڕێت بۆ شەپۆلى كارەبايى. |
| ميكروفون كربوني | Carbon microphone | ميكرۆفۆنى كاربۆنى، كەلێنێكى تيادايە پڕە لە دەنكۆڵەى كاربۆنى. |
| ميكروفون دينامي | Electro dynamic microphone | ميكرۆفۆنى داينەميكى كارەبايى، دەزگايەكە شەپۆلى دەنگ دەگۆڕێت بۆ تەوژمى كارەبايى،بەمەش ئەو دەنگانە دەردەبڕێت كەوان لەبەردەميدا. |
| ميكروفون ذو مكثف | Condensor microphone | ميكرۆفۆنى خەستكەرەوە، دەزگايەكە دەنگەكانى بەردەمى دەگۆڕێت بۆ تەوژمى كارەبايى‌و ئەو دەنگانە لە رێگەى خەستەكەرەوەيەكى كارەبايى دەردەبڕێت، بە زۆريى بۆ تۆماركردنى دەنگ لە سينەمادا بەكاردێت. |
| ميكرون | Micron | مايكرۆن، يەك بەش لە هەزار بەش لە مليمەترێك، هەزار يەكى مليمەترێك، بەشێك لە مليۆن بەشى مەترێك. |
| ميكرو فاراد | Micro Farad | مايكرۆ فاراد، يەكەى وزەو فراوانى كارەبايى. |
| ميكرو ميكروفاراد | Micromicro Farad | مايكرۆ فاراد، يەكەى پێوانى فراوانى كارەبايى دەكاتە($١٠^{١٢}$) فاراد. |
| ميكروغراف | Micrograph | ميكرۆگراف، ئامرازێكە بۆ وێنەگرتنى شتومەك لە ژێر ميكرۆسكۆپدا. |
| ميكروغرافي | Micrography | ئەو زانيارىيەى كە باسى چۆنێتى ئيش كردنى ميكرۆسكۆپ ئەكات. |
| ميكرو باروغراف | Microbarograph | ميكرۆپاراگراف، بارۆمەترێكى ئۆتۆماتيكىيە گۆڕانى كەم‌و خێرايى هەوا تۆمار دەكات. |
| ميكروغرام | Microgram | ميكرۆگرام، يەك بەش لە مليۆن بەشى گرامێك. |
| ميكروتوم | Microtome | ميكرۆتۆم، توێژاڵى تەنك لە لەشى زيندەوەردا بۆ بينينى بە ميكرۆسكۆپ. |
| ميكرولت | Microlut | ميكرۆلت، دەرمانێكە بۆ نەهێشتنى سك پڕ بوون بەكاردێت. |
| ميكروليتر | Microliter | ميكرۆليتر، بەشێك لە مليۆن بەش لە ليترەيەك. |
| ميكرولايت (راجع مايكرولايت) | Microlite | ميكرۆليت، يەكێكە لە كەرەسە خاوەكانى تانتاليۆم، بە شێوەى گۆگرديدى تانتاليۆم‌و زيبو هەيە بە شێوەى كريستالى وردى رەش. |
| ميكروليتي | Microlitic | ميكرۆلايتى، پەيكەرى كەڤرى ئاگرين كە لە بلوورى ميكرۆسكۆپى هارتەربيى پێكهاتبێت لە ناوەندێكى شوشەيدا. |
| ميكروبايولوجي = علم الأحياء المجهري | Microbiology | زانيارى ميكرۆبەكان بە هەموو لق‌و باسەكانىيەوە. |
| ميكروكلين = فيلدسبار البوتاسيوم | Microcline | ميكرۆكلين، بريتىيە لە سليكەيتى پۆتاسيۆم‌و ئەلەمنيۆم بەشێوەى كريستال. |
| ميكروكيمستري | Micro chemistry | كيمياى مادە وردەكان. |
| ميكا - بلق | Mica | ميكا، تێكەڵاوە لە چەند كانزايەك بە شێوەى كريستال، وە باشترين مادەيە دژى كارەبا، واتە كارەباى پيادا ناڕوات، لە شووشە ئەچێت، ئەتوانرێ توێژاڵى تەنكى روونى لێبكرێتەوە بۆ بەرهەڵستى گەرمى كارەبا بەكار ئەهێنرێت، بريتىيە لە خوێيەكانى سليكەيت كە ئەلەمنيۆم‌و پۆتاسيۆم‌و مەگنيسيۆمى تيادايە، دوو جۆر ميكا هەيە: رەش كە ئاسن‌و مەگنيسيۆمى زۆر تيادايە، سپى كە ئەلەمنيۆمى زۆر تيادايە. |
| ميكا سوداء - بيوتيت | Black mica = Biotite | ميكاى رەش، يەكێكە لە كەرەسە خاوەكانى مەنكە بريتىيە لە سليكەيتى مەنگەنيزو گەلێك كانزا،بە ئاسانى توێژاڵى لێ دەبێتەوەو رەنگەكەى لە نێوانى رەش‌و زەردێكى بريسكەدار دايە. |

| | | |
|---|---|---|
| میكانیا | Mikania | رووەكێكی كەپری ناوچە گەرمەكانە ، گوڵەكەی سپی یان پەمبەییە. |
| میكروب - جرثومة | Microbe | میكرۆب، زیندەوەرێكی ئەوتۆ كە بە چاو نابینرێت. |
| میكروبي - جرثومي | Microbal | میكرۆبی، هەرشتێك پەیوەندی بە میكرۆبەوە هەبێت. |
| میكعة | Vomer = Ploughshare bone | ئێسقانی مەلاشوو. |
| میكسا فورم | Mexaform | مێكسا فۆرم، دەرمانێكە بۆ چارەسەركردنی سك چوون بەكاردێت، بە شێوەی حەب هەیە. |
| میكسین | Myxine | گیاندارێكی كوێرە لە شێوەی كرم دایە لە دەریادا دەژی، مشەخۆرە بەسەر ماسییە گەورەكانەوە. |
| میل - نزعة - هدف | Tendency = Proclivity | ئارەزوو، بەتایبەتی بەرامبەر شتی خراپ. |
| میل - میل ارضي - میل بري - (قیاس طولي) | Mile | میل =١٧٦٠ یاردە =٥٢٨٠ پێ =١٦٠٩ مەتر= (٤٠٠٠) باڵ. |
| میل - مرود العین | Eye Pencil = Kohl Pencil | میل، كلچێوك. |
| میل - نصبة الامیال | Milepost = mile stone | پەیكەر، پایە، وەكوو میلەكەی حاموراب‌ی. |
| میل - رغبة | Desire | ئارەزوو، هەوەس، حەز. |
| میل - میلان | Declination-Inclination | لادان، لاری. |
| میل - انتماء = انحیاز | Taxis | چوونەپاڵ، چون بەرەو شتێك. |
| میلادار - میلان | Inclination of orbit | لاریی، سورگە، لاریی خولگە، بریتییە لەو گۆشەیەی كە لە ئەنجامی یەكتر برینی ئاستی خولگەی ئەستێرەیەك‌و ئاستی خولگەی زەوی ، بە دەوری خۆردا پەیدادەبێت، بۆ نموونە لاریی خولگەی ئەستێرەی گەرۆك بەرجیس (مریخ) (٧) پلەیە. |
| میل بحري - قیاس متري - قیاس انكلیزي | Knot = Nautical mile | میلی دەریایی، یەكەی پێوانی دووریی لە دەریادا دەكاتە (٦٠٨٠) پێ، (١٨٥٢) مەتری جیهانی، (١٨٥٥) مەتر لە ئینگلتەرە. |
| میل الكواكب | Declination | ئەو گۆشەیە كە لە نێوانی رووی رێكی ئاسمان‌و ئەو هێڵەدا پەیدا ئەبێت كە ئەستێرەكەو زەوی كەوتوونەتە سەر. |
| میلي | Milli | یەك لە هەزار، بەشێك لە هەزار بەش. |
| میلیمایكرون | Millimicron | $10^{7}$ سم. |
| میلیامبیر | Milliampere | میلیئەمپێر، بەشێك لە هەزار بەشی ئەمپێر. |
| میلمتر | Millimeter | میلمەتر، یەك لە هەزاری مەتر=١/١٠ ی سانتی مەترێك. |
| میللتر | Milliliter | ملیلتر، یەك بەش لە هەزار بەشی لیترێك. |
| میلامین | Melamine | مادەیەكە لەگەڵ فۆرمالدیهاید كار لێك دەكات پلاستیك پەیدا دەكات ئاوێتەیەكی سپییە. |
| میلانیت - عقیق اسود | Melanite | میلانایت، یاقیقی رەش. |
| میلانین - قتامین | Melanin | میلانین، رەنگێكی رەشی مەیلەو قاوەییە لە پێست‌و قژا هەیە، بەرگری تیشكی خۆر ئەكات، لە لەشی گیاندارو رووەكدا هەیە. |
| میلید | Milid | میلید، دەرمانێكە بۆ چارەكردنی ترشەڵۆكی گەدە، بەشێوەی حەب‌و دەرزی هەیە. |
| میلانیة - قتامیة - داء قتامي | Melanosis | نەخۆشی رەش بوون. |
| میلونیت | Mylonite | میلونایت، كەڤرێكی وردو خاش بوو هەتا رادەیەك دەنكۆڵەكانی وردن. |

| | | |
|---|---|---|
| ميلريت - نيكل بليند | Millerite = nickelblende | ميلرايت، كانزايەكە بريتىيە لە گۆگردیدی نیکل، رەنگەكەی برۆنزی كاڵ، لە دواییدا خوڵەمێشی هەڵدەگەرێت، کەرەسەیەکی خاوە بۆ نیکل. |
| ميليشيا | Militia | میلیشیا، بەشێکە لە هێزە چەکدارەکانی میری، لـە كـاتی پێویستدا بـۆ فرمانی تایبەتی بانگ دەکرێن. |
| ميلاد | Birth = birth Place = birthday | زایین، کاتی لە دایك بوون شوێنی لەدایك بوون. |
| ميلادي | Birthday | زایینی. |
| ميلانوسيريت | Melanocerite | میلانوسیریت، یەکێکـە لـە کەرەسـە خاوەکـان، زرکۆنیـۆم و كالیۆمیشـی تیادایە، دیمەنێکی رەشی مۆمی هەیە لە سویدو ئۆنتاریۆ هەیە. |
| ميمنة | The right side | لای راست. |
| ميمون | Blessed | پیرۆز. |
| ميمون - قردوح - حودل - رباح - دباح | Maimon = papiomaimon = Baboon = Mandrill | مەیمون، ماندریل، مەیمونێکی کەتەی درندەی دەموچاو لاکێشییە لچی ئەستورە، کلکی کورتە کەلپەکانی وەك کەلپەی سەگ وایە، لە خۆرئاوای ئەفەریقا ئەژی. |
| ميموسة - ميموزا - ميموسا الحساسة | Mimosa | میمۆسا، رووەکێکی شەرمن، جۆرە رووەکێکە کە دەست بدەی لە گەڵاکانی لوول ئەخۆن واتە شەرم ئەکەن. |
| ميمولس - دندل | Mimule = Minulus | جۆرە رووەکێکە |
| ميميتيت | Mimetite | (میمیتـایت)، مەعدەنێکـە لـە قورقوشـم و زەرنیـق و ئۆکسـجین و کلـۆر پێکهاتووە، رەنگەکەی زەردی کاڵ بەرەو زەردی مەیلەو قاوەیی، هـەندێك جار سپی یان بێ رەنگە کەرەسەیەکی خاوی ناوەنجی قورقوشمە. |
| ميماس | Mimas | میمـاس، بچووکـترین پاشـکۆی هەسـارەی کەیوانـە (زحـل) دووریـی لـە ئەستێرەکەیەوە ($115\times10^3$) میلـە، تیرەکـەی (٣١٠) میلـە زانـا هێرشـل لـە ساڵی ١٧٨٩دا دۆزیویەتییەوە. |
| مينا - رعي الحمام | Verbena = Vervain | مینا، گیایەکە گوڵی هەمەرەنگ دەگرێت بەتایبەتی شین. |
| مينا | Mina | مینا، یەکەی دراوی کۆنە، دەکاتە (١-٢) پاوەند. |
| ميناء - مينا بحري | Portharbour | بەندەر،مینا،دەراف، دەراو، لەنگەرگا، پەسار، لێمان، کەشتی خانە، شوێنی وەستانی کەشتی. |
| ميناء جوي - مطار | Airport | فرۆکەخانە. |
| ميناء شجري | Lantana = wild sage | لانتا، درەختی مینا، دەوەنێکە گوڵەکەی لە گوڵی مینا ئەچێت. |
| ميناء الأسنان | Dentiumnitor | مینای ددان، چینێکە لە چینەکانی ددان. |
| ميناء الرمل | Sand verbena | مینای لم، رووەکێکی خشۆکە گوڵی هەمەرەنگی بۆنخۆش دەگرێت سپی و زەرد و سوور. |
| مينات - كراكولة | Gracula | باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی ریشۆڵە رەنگەکـەی رەشی بریسـکەدارە مەیلـەو سـەوز ئەنوێنێت، دەنووکی و چرنووکی زەردە، هەندێك لە شاباڵەکانی سپییە. |
| مينة | Mynah = myna | مینە، ماینا، باڵندەیەکە لە ئاسیا دەژی . |
| مينتزول | Mintezol | مینتیزۆل، جۆرێکە لە دەرمانی کرم وەکوو کرمی دەزوولەیی و ئەنگلستۆما بەشێوەی حەب هەیە. |
| مينو | Minnow | ماسییەکی رووباری بچووکە. |
| مينيوم | Minium | مینیوم، ئۆکسیدی قورقوشمی سوور. |
| مينيسترون | Minestrone | مینیسترۆن. شۆربایەکی خەستە لە سەوزەو ماکەرۆنی دروست دەکرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| مینوویت | Minuet | مینیویت. جۆرێکە لە سەما، بە شێنەیی و هێواشی دەکرێت. |
| مینوطور | Minotaur | مینۆتۆر، گیاندارێکی ئەفسانەیی‌یە نیوەی لەشی لەشێوەی پیاوو نیوەکەی تری لە شێوەی گادایە. |
| مینورقیة | Minonrca | منیۆرکا، رەچەڵەکێکە لە مریشك. |
| میوه - لباس مایو | Bathing dress | جلی مەلەکردن. |
| میوغلوبین | Myoglobin | مـایۆگلۆبین، بۆیەیـەکی پرۆتینی‌یـە (سـووره چونکـە ئاسـنی تیادایـە) لەماسولکەکاندایە لە هیمۆگلۆبین دەچێت. |
| میوبیا | Myopia | مایۆپیـا، کزبوونـی چـاو بـەهۆی پـیریی بـە زەرەبینـی بڵاوکـەرەوە چارەدەکرێت. |
| میوزة | Meiosis | شێوەیەکە لە دابەش بوونی ناڕاستەوخۆ خانەکەی لـەش بە دوو دابـەش بوونی یەك لە دوای یەك دەبێت بە چوار. |
| میوما | Myoma | ئاوساویی یەك لە ماسولکەدا. |
| میوکوبروتین | Mucoprotein | میوکۆپرۆتین، ئاوێتەیەکە شەکری تیادایە لە شانەو شلەکانی ناو لەشدا هەیە. |
| میوسین | Miocene | میوسین، یەکێکە لە سەدەکانی سەردەمی سی‌هەم، سەردەمێکە لە دێرینی ژیانی نوێ. |
| میوسین - عضلین | Myosin = Moysin | مایۆسین، گلوبیولینێکـە (واتـە پرۆتینێکـە لـە ئـاودا شـی نابێتـەوە) لـە پلازمای ماسولکەدا هەیە. |
| میولیق | Majolica | ماجۆلیکا، جۆرێکی رازاوەیە لە فەخفووریی ئیتالی. |
| منیا - میناء | Enamel = adamant | مینا، مادەیەکی شووشەیی رەنگینە رووکەشی شووشەو فەخفووری پێ دەکرێ. |

| | | |
|---|---|---|
| نائي = بعيد | Distant = Faraway = remote | دوور. |
| نائم | Dormant = asleep | نووستو، خەوتوو، نفستی. |
| نائب | Representative = agent = substitute | جێگر، نوێنەر، هەڵبژێراو، بۆ ئەنجوومەنی جێگرەکان. |
| نائب = عضو مجلس النواب | Member of Parliment = Parlementary- deputy | پەرلەمانتار، ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەران یان پەرلەمان. |
| نائب القنصل | Vice-presodent, Vice-comsul | جێگری قونسل. |
| نائب الرئيس | Vice-president | جێگری سەرۆك. |
| نائب الملك | Viceroy | جێگری پاشا. |
| نائب عام | Public Prosecutor generel | جێگری گشتی. |
| نائبـــة - مصيبـــة، فاجعة | Calemity, catastrophe | کارەسات، بەڵا. |
| ناب | Canine tooth = Tusk | کەڵبە، قیل، شفرە، شوفرە، کێلبە. |
| ناب = سن الأفعى = ناب الحية | Fang | دانی مار، دوو ددانی تیژی چەماوەو کلۆرن لەناودەمی ماردا، لە لووی تایبەتییەوە مادەی ژەهریان بۆ دێت، ئەو ژەهرەی کە دەیکاتە لەشی دوژمنەوە. |
| ناب الخنزير | Canine of Pig = tusk | شڵفە، شفرەی بەراز. |
| ناب كبير | Big Canine | کەڵبەی گەورە، شرن. |
| نـــاب الجمـــل - نقطـــة دم - ادونيس خريفي - عين الديك | Adonis = Phesant eye | ئەدۆنیس، چاوەکەڵەشێر، کەڵبەی ووشتر، گیایەکی کێوییە گوڵێکی سووری کاڵ ئەگرێت. |
| نابذة - لة الطرد المركزي | Centrifugal- separator | ئامرازی دەرکەر، ئامرازی دەرپەرێنەر، مەکینەیەکە بەهێزی دەرپەڕاندنی چەقی کاردەکات، وەکوو ئەوەی کە کەرە لە ماست جیا دەکاتەوە. |
| نابي | Eanine, canine | کەڵبەیی، هەرشتێك پەیوەندی بە کەڵبەوە هەبێت. |
| نابط | Extrusive | لاڤای رەق یان پتەو. |
| نابوليون | Napoleon | ناپۆلیون، ناپلیۆن، دراوێکی فەرەنسی زێڕینە دەکاتە (٢٠) فەرەنکی فەرەنسی هەروەها جۆرێکە لە شیرینی. |
| نابليونية | Napoleona | ناپلیۆنیا، دەوەنێکە لە کۆمەڵەی مۆرد بەناوی ناپلیۆنەوە ناونراوە گوڵێکی خڕی شین ئەگرێت. |
| نابنط - سلوى | Pitcher Plant | دارمەسینە، دەوەنێکە گەڵاکەی تورەکەی پێوەیە لە مەسینە دەچێت، شیلەیەکی شیرینی تیادایە، ئەگەر مێرووی تێ بچێت دێتەوە یەك و مێرووەکە تێك دەشکێنێت و دەیمژێت. |
| نابت - نام | Growing | رووا، شین بوویی. |
| نابام | | دەرمانێکە شلە بۆ لەناو بردنی نەخۆشی رووەك بەکار ئەهێنرێت. |
| نابالم | Napalm | ناپاڵم، سابونێکی ئەلەمنیۆمییە لە ترشە پیوییەکانی وەکوو رۆنی گوێز هێندو ترشە نەفتینییەکان، لە دروستکردنی بۆمبای سووتێنەردا بەکاردێت. |
| نابض | Spring | زەمبەلەك، سپرینگ. |
| نابض حلزوني | Coil spring | زەمبەلەکی پێچاو پێچ. |
| نابغة | Adisting = illustrious | زانای بلیمەت، زانای هەڵکەوتوو، دانا. |

| | | |
|---|---|---|
| نابض | Contractile = Pulsatile | پرتەکەر. |
| نابضات - خافقات - بلسارات | Pulsars | پولسارەکان، پرتەکەرەکان: ئەمانە ئەستێرەی نیوترۆنین، ئەو وزەی کارو موگناتیسی‌یەی کە لێیان دەردەپەرێت، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ، بەپێی جۆری ئەستێرەکە دەگۆرێت، بۆ نموونە لە ماوەی (٣٣-٤)چرکەدا، ئەم ئەستێرە پرتەکەرانە تیشکی رادیۆیی بەهێز، بەشێوەی پرتەی بەردەوام و رێك و پێك دەردەپەرێنن، ئەمانە لە ساڵی ١٩٦٧دا دۆزراونەتەوە، گرنگترینیان ئەو ئەستێرە پرتەکەرەیە کە لە سەدیمی(نیبۆلای) قرژاڵدا (crab nebula) هەیەو بریتی‌یە لە پاشماوەی تەقینەوەی ئەستێرە گەرۆکە مەزنەکان. |
| نابض السلاح الناري - غماز، مقداح | Trigger | پەلەپیتکە، وەکوو هی دەمانچە. |
| ناتج - حاصل | Resultant = resulting = product | دەرئەنجام، بەرەنجام، بەرهەم. |
| ناتج - ناجم | Consequent | پەیدابوو. |
| ناتج جانبي - ناتج ثانوي | By product | بەرهەمی لا بەلا، ئەنجامی لابەلایی، بەرهەمی دووەمین. |
| ناتریوم - سودیوم - ND | Sodium Natrium | جۆرەکانزایەکە ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (١١)و کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (٢٣). |
| ناتيء - بارز | Extuberant = Prognathus = Prominent | قوت، چوکڵەدار. |
| ناتولان | Natulan | (ناتولان)، دەرمانێکە بۆ چارەکردنی وەرەم بەکاردێت بەشێوەی گولاجە. |
| ناترولیت - نترولیت | Natrolite | ناترۆلایت، جۆرێکە لە مەعدەن، لە سلیکاتی ناویی ئەلەمنیۆم و سۆدیۆم، بێ رەنگ، بەرەو سپی خۆڵەمێش، زەرد سوور. |
| ناتج الجمع | Reult = Product | ئەنجامی کۆکردنەوە. |
| ناج - هارب - ناجي | Escapee | رزگاربوو. |
| ناجح | Passed = succesful | دەرچوو، سەرکەوتوو. |
| ناجذ - ضرس العقل - سن ضاحكة | Molar = wisdom tooth backK tooth | خرێ، ددانی دواوە، ددانی ژیری، سێ رەگی هەیە، یەکێکە لە هەشت ددان لە دەمی مرۆڤدا، لەنێوان کەڵبەو خرێدا. |
| ناجز - منجز | Achieved | جێبەجێ کراو. |
| ناجع - مؤثر | Effective | بەکار، چالاك. |
| ناجمة - غصن التطعيم، طعم، مطعوم | Scion | ئەو لقەی کە بۆ متوربە ئامادە دەکرێت. |
| ناجور - دمجانة | Demijohn = Carboy | دەمجانە، بوتڵێکی شووشەی گەورەیە بە پووش داپۆشراوە، بە زۆری مەیی تێ‌دەکرێت. |
| ناحية، اقليم | District = region | ناوچە، مەیان، هەرێم. |
| ناحية - جهة | Side = direction | لا، تەنیشت. |
| ناخس - نخوس | Nakong | جۆرێکە لە ئاسکەکێوی رەنگەکەی قاوەیی‌یە هێڵی سپی تیادایە، دوو شاخی گەورەی هەیە. |
| ناخب | Constituent = elector | هەڵبژێرەر. |
| ناخر | Decayed = rotten | کۆن و رزیو. |
| نادر | Rare = Scarce | بەدەگمەن، دەگمەن، ناياب. |
| نادل - خادم الضيافة - سفرجي | Waiter | بۆی، شاگردی یانەو چایخانە. |
| نادي - منتدى | Club | یانە. |
| نادي ريفي | Countryclub | یانەی گوند، یانەی لادێ. |

| | | |
|---|---|---|
| نادم - متندم | Repentant | پەشیمان. |
| نار | Fire | ئاگر، ئاوور، ئاتەش. |
| ناركوتين | Narcotine | نارکۆتین، مادەیەکی ئەلکالۆیدی سڕکەرە لە تلیاك دەردەهێنرێت. |
| ناروبل = نرول - كركدن البحر - حريش البحر | Nar whale | جۆرە نەهەنگێکە. |
| ناري، بركاني | Igneous | ئاگرین، ئاتەشی، ئارگۆنی، ئاگرین، شتێك لە ئاگر بچێت. |
| نار القديس المو | | ئاگری قدیس ئیلمۆ، پریشکێکی کارەبایی نزیکە بەردەوامە ، تینەکەی جیاوازە، لەسەر تەنە نووك تیژەکانی سەرزەوی دەردەکەوێت وەکوو لەسەر تریشقەگر (مانعە الصواعق) تیڵای کەشتییەکان یان لەسەر باڵی یان پەروانەی فڕۆکەکان، ڕەنگەکەی بنەوشەیی و مەیلەو سەوزە ، بەشەو بە ئاسانی دەبینرێت، بە زۆریی ئەگەر کەش تریشقاویی بوو بەهۆی چالاکی کارەبایی کەشەوە. |
| نارة | Acan thosicyos Horrid | دەوەنێکە لە کۆمەڵەی ڕیشاڵدارو دڕکاوییە، گوڵەکەی گەورەو بەرەکەی لە پرتەقاڵ دەچێت تامەکەی خۆشە، تووەکەی بە کاڵی و بە کوڵاوی ئەخورێت. |
| نار فارسية | | ئاگرە، هەوڵە، زڵزڵە، کە بلق و زیپکەی لەگەڵدایێت. |
| نار هندية | Indian Fire | ئاگری هیندی، تێکەڵاوێکە لە نیتراتی پۆتاسیۆم و گۆگرد و دووەم گۆگردیدی زەرنیق لە دروستکردنی گلۆپی ڕەنگاورەنگی پەرینەوەی جادەدا بەکاردێت. |
| نار هندي - مهو - نار مشك | Inon wood = Indian rose Chost nut | درەختێکە لە هیندستان ئەڕوێت، گوڵەکەی بۆنخۆشە ،بەرەکەی دەنکێکی گەورەی بۆنخۆشی تیایە لە کەستانە ئەچێت ئەخورێت تەختەکەی بەنرخە. |
| نارجيل = جوز الهند - رارنج - شعصور - مشرج | coconut Palm = Cocos | گوێزی هیندی، درەختێکە لە کۆمەڵەی دارخورما، قەدەکەی ڕیشاڵدارە، گەلێك جۆری هەیە، لە ناوچە گەرمەکان ئەڕوێت، بۆ مەبەستی ڕازاندنەوەو کشتوکاڵ و پیشەسازی بەکاردێت، بەرەکەی هێلکەیی یە نزیکەی ٢٢سم درێژ ئەبێت ، توێکڵی بەرەکەی تەختییە بە ریشاڵ داپۆشراوە کرۆکەی سپییە تامەکەی خۆشە بۆ خواردن و مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| نارجيل صخري | Geode | جیۆد، بۆشاییەکی بەردینە بە کریستاڵ ناوپۆش کراوە. |
| نارجيل - شيلي - جوبية | Coquito Palm = Palm Of chile = Jubaea | گوێزی هیندی، شیلی، گوێزی شیلی، درەختێکە بۆ ڕازاندنەوە لە کۆمەڵەی دارخورمایە. |
| نارجيلة - شيشة | Narghile = hubble bubble | نێرگەلە، جۆرێکە لە ئامرازی جگەرە کێشان. |
| نارنج - نفاش - ابوصفير | Sour Orange = Bitte Orange = Seville orange | نارنج، درەختێکە لە کۆمەڵەی لیمۆ، بەرەکەی لە پرتەقاڵ ئەچێت، تامەکەی ترشی مەیلەو تاڵە توێکڵەکەی ئەکرێت بە مرەبا. |
| نارنجي | | نارەنگی، نارنجی. |
| ناردين - سنبل - حشيشة القط | valerian | ناردین، گیایەکی تەمەن درێژە، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووە ڕەگەکەی ئەستوورە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| ناردين الطيب - ناردين هندي - ناردين سنبلي، سنبلة | Indian Valerian = Nardus = Spikenard = nard | جۆرێکە لە ناردین ی دەشتەکی پزیشکی ، ڕەگەکەی ئەستورە برێکی زۆر لە مادەی عەتری تیادایە، گوڵەکەی بە شێوەی هێشووە، بچوك و بۆن خۆشە، لە ڕەگەکەی ڕۆنێکی عەتری نایاب دەردەهێنرێت. |
| ناردين بري - أسارون - اساروم، سنبل بري | Wild nard = Asarabacca | سونبولە کێویلە، گیایەکی تەمەن درێژی پزیشکییە لە کۆمەڵەی (زەراوەند). |

| | | |
|---|---|---|
| ناريد | Nereid | نێرید، مانگی دووەمی هەسارەی نیپتۆن. |
| نازلي | Hake | هێك، ماسی‌یەکی دەریایی‌یە. |
| نازي | Nazi | نازی، هەڵگری بیروباوەری نازیزم. |
| نازية | Nazism | نازیزم، سۆسیالیستی نیشتمانی ئەڵمانی. |
| نازف | bleeding | پڕاو، پڕێنەر، بریندار. |
| نازح عن وطنه | Emigrant | کۆچ کردوو، لە نیشتمانەوە. |
| نازح المجارير - صرباتي | Night man = bailer | ئەو کەسەی ئاوی زێراب دەردەدات. |
| ناس - أناس | People | خەڵکی، کەسان. |
| ناسا - الأدارة القومية للملاحة الجوية وشؤون الفضاء الأمريكية | NASA = National Aeronaustic and Space Administration | ناسا، بەڕێوەبەرێتی نەتەوایەتی کەشتی وانی و کاروباری بۆشایی ئەمەریکی. |
| ناسور - ناسور الشرج | Fistula = Anal-Fistula = Sinus | (١) بەورە شینکە، موو، برینێکی پیسە لە دەست و پەل دەردێت. (٢) مەیاسیری، مایەسیری پەیدابوونی گرێ لە دەورو پشتی کۆم. |
| ناسور العين | | دگدگە، سیچکە، سلاوە، قنچکە سلاوە. |
| ناسوفرين | Nasophrine | ناسۆفرین، جۆرێکە لە قەترەی لووت. |
| ناشر | publisher | پەخشە، بلاوکەرەوە. |
| ناشيء - حادث | Arising = Proceeding | درووست بوو، پێکهاتوو، پەیدا بوو. |
| ناشف - جاف | Dry | ووشك. |
| ناشر(للكتب) أو الأخبار أو الأعلانات | Publisher | بلاوکەرەوە : بۆ کتێب یان دەنگو باس یان بۆ زانین. |
| ناشر - صل مصري | Asp = Cobra = haje = Naja = haje | کۆبرا، جۆرە مارێکە زۆر ژەهراوی یە، ماری چاویلکەدار. |
| ناشرة، ناشرة الضوء | Diffuser | ئامرازی بلاوکردنەوە وەکوو لە پیشەسازی شەکردا. |
| ناشرة الخشب | Wood eater = lymexy lon | تەختە خۆر، مێروویەکی لاکێشەیی نەرمە تەختە ئەخوات. |
| ناشرة الدريس - مبيسة الكلاء | Tedder | مەکینەیەکە گیاگزمرە (ئالف) بلاو ئەکاتەوە هەڵی دەگێڕێتەوە هەتا وشك دەبێتەوە. |
| ناشز - ناتي | Protruding = elevated | لووتکە، چوکلە. |
| ناشط - ارخ - ابو حراب - ابو سولع - هيطلة - مارية - بيسة - وصيحي - ارخ سوداني | Oryx | مانگا کێوی، چەند جۆرێکی هەیە، جوتێك شاخی بن لقی درێژی هەیە، لەناوچە بیابانەکاندا دەژی. |
| ناصع البياض) | Pearly white | سپی، چۆر، زۆر سپی، روون ، کەڤەر. |
| ناصعة،نافخة - زقنبوت | Buprestis | (١) ژەقنەمووت، مێروویەکە لەسەر رووەك ئەژی، بوونی بە زۆری لەسەر گیای لەوڕ دەبێتە هۆی باکردنی ئاژەل، چونکە ئاژەل بە گیایەکەوە ئەیخوات. (٢) مێروویەکی زۆر رەنگینە. |
| ناصح - مقدم النصيحة | Adviser = Counsellor | نەسیحەتکەر. |
| ناصف - منصف | Bisecting = bisector | لەتکەر، شتێك شتێکی تر بکات بە دوو لەتی یەکسانەوە |
| ناصية | Forepart of the head | پێشەسەر، ناوچەوان. |

| | | |
|---|---|---|
| ناصية | Foretop | ئەو تۆپەڵە مووەی کە بە ناوچەوانی وڵاخ دا شۆڕبۆتەوە. |
| ناصية - شعر مقدم الراس | ForelocK | پەرچەم، قژی سەر ناوچەوان. |
| ناصية = ركن | Corner | گۆشە، قوژنە. |
| ناضع | Clear = Pure | ئاشکرا، روون، پاك. |
| ناضج - نضيج | Ripe = Mature | گەییو، پێ گەیشتوو، گەیشتوو، پێ گەییو، گەییك، رەسکاو، گەشتی هەراش. |
| ناضر، جميل، طازج | Fresh = beautiful | گەش، جوان. |
| ناضح | Over mature osmosis | دەڵێنەر، دادەر. |
| ناضب | Dry | بەبێ، نەماو، وشك، وشکانی. |
| ناطق | Speaking | گوێبیندە، قسەکەر. |
| ناطحة السحاب | Sky scraper | بەرزە تەلار، ساختمانێکی زۆر بەرزە لە دەیان نهۆم پێکهاتووە. |
| ناطور | Ranger = Field guard | پاسەوانی باخ، باخەوان، پاسەوان، رەزڤان. |
| ناطف | Icing | پەشمەك، شەکرێکی بادراوە دەخرێتە سەر شیرینی. |
| ناظر المدرسة | Headmaster | بەڕێوەبەر، وەکوو بەڕێوەبەری قوتابخانە. |
| ناظر مزرعة | Farm bailiff | چاودێر، سەرکار. |
| ناظرة = عين | Eye | چاو. |
| ناظر - رقيب - ابو عيون | Tarbophis = Cat snaks | پشیلە مار، ماریشیلە، مارێکی ژەهرداری شێوە لاکێشەیی مل باریکی سوکڵەیە ، رەنگەکەی قاوەیی مەیلەو خاکییە. |
| ناظم - منظم | Regulator | رێکخەر. |
| ناظلي - رعي الحمام | Verbena | مینا، گیایەکە گوڵی جوان دەگرێت. |
| ناظم(للماء) - نواظم مائية | Barrage | بناوان. |
| ناعورية - هيموفيليا | Hemophilia | هیمۆفیلیا،، لوت بڕانی زکماکی. |
| ناعور | Water wheel = noria | چەرت،جەنجەر، ئاوهەڵێنجەر، ئاو هەڵکێش، چەرخێکە سەتڵی پێوەیە بۆ هەڵهێنجانی ئاو لەبیر. |
| ناعورة - سانية | Noria = Chain Pump | ئامرازێکە بۆ هەڵێنجانی ئاو بەهۆی چوارپێ یان مەکینەوە ئیش دەکات. |
| ناعور هوائي - دولاب الهواء | Aeolian | ئامرازێکە بۆ هەڵێنجانی ئاو بە هەوا ئیش دەکات. |
| ناعورة هوائية - طاحونة هوائية | Wind mill | ئاش با، ئاش هەوایی، ئامرازێکە بە با ئیش دەکات (دەجوڵێت) بۆ ئیش پێکردنی ئامرازو پەیداکردنی هێز بەکاردێت. |
| ناعورة - غيردية | Gaillardia | گیلاردیا، رووەکێکە لە کۆمەڵەی ئاوێنەکانە گوڵی جوان دەگرێت. |
| ناعوظ - مقوه للباه | Aphrodisiac | کێر بەهێزکەر، هەر دەرمانێك ببێتە هۆی بەهێزکردنی کێر. |
| ناعل - منعل | Shod | نالکراو. |
| ناعم - دقيق | Smooth = Soft = Fine | ورد، نەرم، ساف. |
| ناعمة - قويس - مريمية | Salvia | مریەمی، گیایەکە گەلێك جۆری هەیە زۆربەی دەشتەکییە هەندێکی پزیشکیو هەندێکی گەلاکەی دەخورێت. |
| ناغانة | Nagana | ناگانا، نەخۆشییەکە تووشی گیانداری ماڵی دەبێت بەهۆی جۆرە مێشێکەوە. |
| نافجة | Musk bladder | توورەکەی مسك(لەناو سکی ئاسکدا). |
| نافر | Aversion | سرك، چەمووش، بەلەسە. |

| | | |
|---|---|---|
| نافثا - نفط | Naphtha | نافثا، یەکێکە لە بەرهەمەکانی نەوتی سروشتی. |
| نافخة - منفاخ | Bellow | چەمپ. |
| نافخة البقر | Buprestid | گابا پێکەرە، مێروویەکە خەڵکی لەو باوەڕەدا ئەگەر گا بەگیاوە بیخوات با دەکات و دەمرێت. |
| نافالیون | Rambutan = Nephelium | نافالیۆن، درەختێکە لە کۆمەڵەی سابونییەکان لە خۆرهەڵاتی ئەوپەڕدا دەڕوێت، جۆرێکی هەیە پێی دەوترێت نافالیون لیتشی (Litchi) بەرەکەی شیرینە. |
| نافع | Useful | بە کەڵك، بە سوود. |
| نافخ في الصور | Blower | شەیپوژەن. |
| نافوخ | Vertex | تەپڵەسەر. |
| نافطة | | تامێسك. |
| نافطة | Vesicant | جۆرە مێروویەکی بە سوودە زیان بە کوللە ئەگەیەنێت و گەراکەی ئەخوات. |
| نافذة | Window | پەنجەرە، کولەك. |
| نافض | Deciduous | هەر ڕووەکێك کە گەڵاکەی هەموو ساڵێك بوەرێت. |
| نافورة - فسقية | Sprinkler = Fountain = Jet | فیچقە، ئاو هاوێژە، فوارە، قوڵقوڵە. |
| نافورة البحر - زقي | Sea Squirt = Ascidian | فوارەی دەریا، جەوەنگەی دەریا، گیاندارێکە بە شێوەی کۆمەڵ لەناو دەریادا دەژی پەیکەرێکی ئەستێرەیی جوانی هەیە شێوەکەی لە جەوەنگە دەچێت. |
| ناقة | She Camel | ئاروانە، ئارڤانە، وشتری مێ، وشتر گیاندارێکی سمداری بەرزی کاوێژکەرە، بۆ سواری و بارهەڵگرتن بەکاردێت. لە ئاسیاو ئەفەریقادا دەژی، دووگی هەیە خۆراکی تیادا کۆ دەکاتەوە. |
| ناقه البحر - أطوم | Dugone | وشتری دەریا |
| ناقوس | | زەنگ، چانکوچ. |
| ناقوس(آلة موسيقية)، المثلث | Triangle (and rod) | زەنگی سێ‌سووچی، ئامرازێکی مۆسیقایە بە شیشێکی پۆڵای پێچاو پێچی سێ سووچی پێکهاتووە. |
| ناقوس - جرس | Semantron = bell | زەنگ، پارچە لەوحێکی مەعدەنییە بەدار لێی دەدرێت بۆ وریا کردنەوە. |
| ناقوس زجاجي | Bell Jar | زەنگی شووشە، لە تاقیگەکاندا بەکاردێت. |
| ناقوس القافلة | | زەنگەو قوڕ. |
| ناقوس صغير | | زەنگۆڵە. |
| ناقصة | Amorpha = bastard indigo | چویتە دروێنە، جۆرێکە لە ڕووەك. |
| ناقص | Minus = deficiency | ناتەواو. |
| ناقصة الأستحالة | Hemimetabola | سووڕی ژیان ناتەواو، ئەو مێروانەی کە سووڕی ژیانیان ناتەواوە وەکوو کوللە. |
| ناقص العقل | Acataleptic | کەم عەقڵ. |
| ناقص الخلقة - ناقص التكوين | Abortive | شەهەت، کەم ئەندام. |
| ناقوط - قطارة | Drop reckoner | دڵۆپێن، تکێن، تنووك تەکێن. |
| ناقد | Acritic = Fault Finder | ڕەخنەگر. |
| ناقل - حامل | De ferense = deferent = bearer = Carrier | هەڵگر، گوێزەرەوە، بۆڕی، کەناڵ: کە شلەیەك بگوێزێتەوە. |
| ناقل للحمى | Febriferous | تاگوێزەرەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ناقل | Vector | هەڵگر، گوێزەرەوە، وەکوو ئەو مێرووەی کە میکرۆب لە کەسێکەوە دەبات بۆ کەسێکی تر. |
| ناقل المرض | Morbiferous = Vector | نەخۆشی هەڵگر، نەخۆشی گوێزەرەوە. |
| ناقلة العدوى | Contagious | میکرۆب هەڵگر، میکرۆب گوێزەرەوە. |
| ناقل | Conveyor | گوێزەرەوە، ئامرازی گواستنەوە. |
| ناقل لولبي | Screw conveyor | گوێزەرەوەی مارپێچی، گوێزەرەوەی پێچاو پێچ. |
| ناقل متذبذب - ناقل مهتز | Vibrating Conveyor | گوێزەرەوەی لەرۆک، گوێزەرەوەی لەرزۆک. |
| ناقب | borer | کونکەر، برینێکە لە کەلەکە پەیدا دەبێت، بەرەو بۆشایی ناو لەش ئەڕوات. |
| ناقب - ناقبة - قرحة الفراش | Bed sore | برینی ناو جێگا، برینێکە لە لەشی نەخۆش دێت لە ئەنجامی زۆر کەوتن لە جێگادا. |
| ناقوبة - نقار | Wood Picker | دار کونکرە، دار کونکەرە، جۆرە باڵندەیەکە. |
| ناقه، فترة النقاهة | Convalescent | بوژاوە، ئەوکەسەی کە تازە لە نەخۆشییەک چاک بوبێتەوە، بەڵام هێشتا هەر مابێتی، لە نەخۆشی هەستاو. |
| ناقم على - حاقد | Ill disposed lowards | رقاوی، قیناوی. |
| ناقة البحر أطوم - ملصة - حنفاء - زالحة | Halicore = Dugong | وشتری دەریا، جۆرێکە لە گوێرەکەی دەریا گیاخۆرە، گۆشتەکەی ئەخورێت، گیاندارێکی گەورەی شیردەری دەریاییە لە ئەمەنگ ئەچێت، رەنگەکەی خۆڵەمێشی مەیلەو شینە، شێوەی سەری لەهی وشتر دەچێت. |
| ناقلة البترول - ناقلة النفط | Oil tanker | کەشتی یان ئۆتۆمبێلی گواستنەوەی نەوت، تانکەر یاخود عەمباری سووتەمەنی وەکو نەوت |
| ناقلة الفحم | Coaler | کەشتی گواستنەوەی خەڵوزی بەردین. |
| ناكريت | Nacrite | ناکرایت، مەعدەنێکی قوڕینە، زۆر بڵاو نیە، لە کۆمەڵەی کانولیتە. |
| نامي - نام | Growing = Increasing | هەڵچوو، گەورەبوو، هەراش. |
| نامية - شطء | Sucker = Offset | چووز. |
| ناموس الكتب - قمل الكتب | Atropes | جۆرە مێرووێکی رەنگ خاکییە پەڕەی کتێبو دەفتەر ئەخوات. |
| ناموسة - بعوض - برغش | Culicina = mosquito | مێشوولە، پێشی، پێشکە. |
| ناموس | Mosquitoes | جۆرێکە لە مێشوولە، مێشوولەی لەرزو تا. |
| ناموس - شريعة | Law = statute, Constitution | دەستوور، یاسا، رژێم. |
| ناموسية - كلة | Mosquito net | پەردەو کوللە، کوللە(دژی مێشوولە). |
| نامية - ورم - (نوامي) | Neoplasm | وەرەمێکی پیس. |
| ناموفيلة - زهرة الأجراح | Nemophila = water leaf | گەڵا ئاو، گوڵێکی ساڵانەیە، لە کۆمەڵەی گەڵا ئاوییەکان. |
| ناندينا | | ناندینا، دەوەنێکی قیتی بچکۆلەی هەمیشە سەوزە نزیکەی (٢) مەتر بەرز ئەبێتەوە بەرێکی سووری خڕی بچکۆلەی هەیە، بەشێوەی هێشوە لەگوێز ئەچێت، بۆ خواردن دەست ئەدات. |
| نانو | Nano | پێشگرێکە بە مانای بەشێک لە بلیۆن بەش ($10^{-9}$) بەشێک لە ملیۆنێک بەشی بلیۆنێک، بۆ نمونە نانوچرکەیەک (nano second) دەکاتە بەشێک لە بلیۆن بەشی چرکەیەک. |

| | | |
|---|---|---|
| نانخواه ننشوة - خلة - صقلين | PicK tooth = Tooth PicK | نانخواز، حەوینج، دارسیواك، رووەکێکی گیای دەشتەکیو کشتوکاڵی‌یە گوڵەکەی لەشێوەی چەتردایە، لە زەوی بەیاردا دەڕوێت، گوڵەکەی سپیو بۆنخۆشە، لاسکی گوڵەکەی بۆ سیواك کردن باشە، گەلێك دەرمان لە تۆومکەی دەردەهێنرێت بۆ چارەکردنی ژانەسكو باکردنو میزکردنو بەرد فڕێدان، دەکرێتە نانەوە بۆنو تامەکەی خۆش دەکات. |
| ناهر | White grape | ترێ سپیکە. |
| ناهور | Bharal | جۆرێکە لە مەڕە کێوی شاخی گەورەو ئەستوورە ژێر سکی سپی‌یە. |
| ناهض - قائم | Rising | هەستاو. |
| ناوق | | پلووسك، پلووسکی تەختە. |
| ناووس - ناؤوس - تابوت حجري للموتى | Sarcophagus | تەرمێکی بەردین بۆ مردوو. |
| ناي | Flute = nay | نەی، بلوێر، بلیل، لولك، شمشاڵ، ئامرازێکی مۆزیقەیە. |
| نايلۆن - نيلون | Nylon | نایلۆن، مادەیەکی پلاستیکی‌یە لە کارگەدا دروست دەکرێت، بۆی هەیە وەك هەویر هەموو شتێکی لێ دروست بکرێت توانای رەنگ کردنی هەیە، بەرگەی ئاوو هەواو گەرمیو ساردی ئەگرێت، لە دروست کردنی گەلێ شتومەکدا بەکار ئەهێنرێت، نایلۆن ناوێکی گشتی‌یە بۆ خێزانێك لە پلاستیك پێی دەووترێت(پۆلی ئەمیدات) ریشاڵی نایلۆن کە یەکەم ریشاڵ ئەندامی قوماشە، لە دوو ئاوێتەی کیمیایی دروست دەکرێت: (١) شەشەم مەثیلی دووانە ئەمین(٢) ترشی ئەدیپیك. خوێی نایلۆن کە لە دوو مادە دروست دەکرێت، بە گەرم کردن دەتوێنرێتەوە دەبرێت بە کونی ورد ووردا لە سەر لەوحێکی پۆلا، بە مەریشاڵی لێ دروست دەبێت کە دەشێت (٤-٧) جار لە خۆی درێژتر بێت ئەمەش دەچنرێتو ریشی لێ دروست دەکرێت، نایلۆن لە دروست کردنی گۆرەوی نایابو جلو بەرگو فلچەو کورسی بچووكو شانەو دوگمەی چاکەتدا بەکاردێت. |
| نايوبيوم - نيوبيوم، كولمبيوم | Niobium Columbium | نایوبیۆم، کولۆمبیۆم، توخمێکی کیمیاگەری‌یە کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (٩٣)و ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٤١) کانزایەکی زیوی یان خۆڵەمێشی‌یە، ناوەکەی لە وشەی (نایوب) واتە (خودلوندی ئەغریقی‌یە کۆنەکان) ئەگرێتەوە ، نیشانەکەی (Nb) (cb) مادەیەکی نەرمە لە کەرسەی خاوی کۆڵەمبیتو پایروکلۆردا هەیە لە دارشتەی پۆلاو کارپێکەرە ناوکی‌یەکانو فیشەکە شێتەو ساروخدا بەکاردێت، هاوتای تیشکدەرەوەی (٩١و٩٢و٩٤و٩٥و٩٧) هەیە. |
| نايس - غنس | Gneiss | نایس، جۆرە بەردە ئەستێیەکی چین چینە لە کانزا پێکهاتووە، بەردێکی گرانیتی گۆڕاوە بە شێوەی شریتو دەنکی یەك لەدوای یەك. |
| نبالة - نبل | Nobleness | خانەدارێتی. |
| نبا - خبر | Information, Intelligence, news | هەواڵ. |
| نبات | Plant = Vegetable | رووەك، شینایی، رووەك لە چواربەشی بنەرەتی پێکهاتووە لە رەگ و قەد و گەڵا و گوڵ. |
| نباتي - مختص بعلم النباتات - عالم بالنباتات | Betanical = Botanist | رووەکی، هەر شتێك پەیوەندی بە رووەکەوە هەبێت، زانا لە رووەکدا، رووەکزان. |
| نباتي - اكل العشب - عاشب | Vegetarian = herbivorous | گیاخۆر، ئەو کەسەی کە لەسەر خواردنی گژوگیا دەژی. |

| | | |
|---|---|---|
| نبات اكل الحشرات | Insectiv one plant | رووەكی مێرووخۆر، جۆرە رووەكێكە مێش و مەگەز ئەگرێت و ئەیخوات. |
| نبات الرعد، فطر | Mushroom | قارچك، كارگ، كوارك. |
| نباتات عالقة، نباتات معايشة | Epiphytes | رووەكە هاوژیانەكان، ئەو رووەكانەی كە لەسەر رووەكی تری زیندوو یان مردوو گەورە دەبن و هیچ جۆرە خۆراكێكیشیان لێ وەرناگرن واتە مشەخۆر نین ، وەكوو قەزە درێژەكان (الطحلب الطويل). |
| نبات ارض | Geophyte | رووەكی زەوی، ئەو رووەكەی كە ئەندامی زاوزێی هەمیشەیی لەژێر زەویدا هەیە وەكوو سەلك. |
| نبات الكوبرا | | رووەكێكی مێرووگرە. |
| نبات الندية - درو سيرة | Drosera | درۆسیرا، رووەكێكە ئاوگێكی لینج دەردەدات مێرووی پێوە دەنووسێت. |
| نبات الليف | Luffa = loofah-gouro | خەرواش، لفكەشامی، جۆرێكە لە كوولەكە، بەهۆی تەرزەوە خۆی هەڵ ئەواسێ، گەڵاكەی خڕو سێ پەلكەیە، گوڵەكەی بچووك و زەردە، بەرەكەی وەك لوولە وایە، لەناو بەرەكەیدا ریشاڵ هەیە، دەریئەهێنرێت كەڵكی لێ وەرئەگیرێ بۆ قاپ شتن. |
| نبات رمام - نبات رمي | Saprophyte | رووەكی گەندەخۆر، ئەو رووەكەی كە خۆراكەكەی لە مادەی ئەندامی مردوو وەردەگیرێت وەكوو ئەو كەڕووەی كە لەسەر نان دەڕێ و باكتریا كە لەسەر ماست دەڕێ. |
| نبات متسلق | Climbing Plant | رووەكی دەلیت، تەرەمار، بادك، رووەكی خۆ هەڵواسەر بەسەر رووەكی تردا. |
| نباتات مائية | Hydrophytes | رووەكە ئاوییەكان : ئەو رووەكانەی كە لەژێر ئاودان یان سەر ئاو كەوتوون واتە لە ئاودا گەشە دەكەن وەكوو قامیش. |
| نبات المكانس | Sweeping (or) broom Plants | رووەكی گەسك، شرت، شرتك. |
| نباتات ملحية | Halophytes | رووەكی شۆرەكات، ئەو رووەكانەی كە لە شوێنی شۆرەكاندا دەڕێن. |
| نبات الشوك - نبات شوكي | Spinal Plants | كەرتەشی، چاوبازە. |
| نبات عصاري | Sap Plants | رووەكی شیلەدار، رووەكی ئاوكدار، لەو جۆرە رووەكەیە كە لە بیاباندا دەڕێ وە ئاوێكی زۆر لە لەشیدا هەیە وەكوو هەنجیری دڕكاویی(سوپێن). |
| نبات نجيلي - نجيليات | Grmineae | رووەكی دەغڵودان، دەغڵودانییەكان، تاك لەتكەن وەكوو گەنم و جۆ و برنج و هەرزن. |
| نبات بري | Uncultivated Plant = wild Plant | رووەكی دەشتەكی، رووەكە كێویلە. |
| نبات جبلي | Alpine Plant | رووەكی كێویلە، رووەكی چیایی. |
| نبات رملي | Arenaceous Plant | رووەكی لمی، ئەو رووەكەی كە لە شوێنی لماندا دەڕوێت. |
| نبات رحيقي - نبات مفشري - نبات عسلي | Melli Ferous Plant | رووەكی شیلەدار. |
| نبات حجالي - نبات سام | Poisonous plant | رووەكی ژەهرین. |
| نبات عالق | Epiphyte | رووەكی رووكەش، رووەكێكە مشەخۆرنیە بەڵام لەسەر رووی رووەكی تر دەڕێ، رەگیشی نیە بیبەستێت بە زەوییەوە. |
| نباتات الخميرة | Yeasts | رووەكی هەوێن: وەكوو كەڕووە تاك خانەكان ناوكیان تیادایەو بە گۆپكە زیاد دەكەن و ئەنزیم دەردەدەن بۆ گۆڕینی كاربۆ هیدرات بۆ ئەلكهول و گازی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن. |
| نبات اليف الملح - نبات ملحي | Halophyte | رووەكی خوێ خواز، ئەو رووەكەی كە لە شوێنی خوێی یان شۆرەكاتدا دەڕێ. |
| نبات ذو فلقتين | Dicoty ledon | رووەكی دوو لەتكەیی وەكوو پاقلە. |

| | | |
|---|---|---|
| نبات زاحف | Creeping Plant | رووەکی خشۆك، ئەو رووەکەی کە بەسەر زەویدا دەخشێت وەکوو رووەکی کاڵەك و شووتی. |
| نبات صمغي | Gummi ferous plant | رووەکی زەمقدار، ئەو رووەکەی کە زەمق دەردەدات. |
| نبات نهري | Fluvial Plant | رووەکی رووباری، ئەو رووەکەی کە لە دەوروپشتی ئاوی رووبارەکاندا (ئاوی شیرین) دەروێت. |
| نبات هوائي | Aero phyte | رووەکی هەوایی، رووەکێك لەگەڵ رووەکێکی تردا دەژی بەبێ ئەوەی مشەخۆربێت بە سەرییەوە وەکوو لاو لاو کە بەسەر رووەکەکانی ترەوە دەژی. |
| نبات وحيد الفلقة | Monocoty ledon | رووەکی تاك لەتکە، وەکوو گەنم. |
| نبات الأقاليم الرطبة | Hygrophyte | رووەکی ناوچە شێدارەکان. |
| نباتات البرد | Micro ther mic Plant | رووەکی سەرما، ئەو رووەکەی کە لە پلەی سفری سەدیشدا دەروێت. |
| نباتات السياخ | Helophytes | رووەکی شوێنە شێدارو زۆنگاوەکان. |
| نباتات صحراوية | Xerophtes | رووەکی بیابان، ئەو رووەکەی کە لە شوێنی وشکانی بیاباندا دەژی. |
| نبات متحجر | Phytolithe = dendrolite | رووەکی بوو بەرد، ئەو رووەکانەی کە لەژێر زەویدا بوون بە بەرد. |
| نبات حولي | Annualplant | رووەکی ساڵانە، رووەکی یەك ساڵی وەکوو گەنم و جۆ. |
| نبات دهني - نبات زيتي | Oleaginous Plant | رووەکی رۆندار، وەکوو کونجی و لۆکەو گەنمەشامی. |
| نبات سكري ١ | Saccharifeous Plant | رووەکی شەکردار، ئەو رووەکەی کە شەکری لێ دەردەهێنرێت وەکوو قامیشی شەکرو چەوەندەر. |
| نبات صبغي | Tinctorial (dye) Plant | رووەکێك رەنگی لێ دەربهێنرێت. |
| نبات ضار | Harmful plant | رووەکی زیان بەخش. |
| نبات طبي - عقاقير | Madicinal Plant | رووەکی پزیشکی. |
| نباتات الصخور | Sayicole Plants | رووەکە کەڤرییەکان، ئەو رووەکانەی کە لەسەر کەڤر دەژی وەکوو قەوزە. |
| نبات عطري - رياحين | Aromatic Plant | رووەکی بۆندار، رووەکی بۆنخۆش. |
| نبات محول | Biennial Plant | رووەکی دوو ساڵە. |
| نبات مسبب للمرض | Pathogenic Plant | ئەو رووەکانەی کە دەبێتە هۆی نەخۆشی لە مرۆڤدا. |
| نبات زهري | Phanerogam = Spermato Phyte | رووەکی گوڵدار. |
| نبات الشمس - اليف الشمس | Hellophyte | رووەکی خۆرخواز، ئەو رووەکەی کە لەبەر خۆردا گەشە دەکات. |
| نبات ثلجية - نباتات الثلوج | Chionophil | بەفرخواز، رووەکی بەفر، ئەو رووەکەی کە حەز بە شوێنی بەفر دەکات. |
| نباتات بذرية | Spermato Phytes, Seed Plants | رووەکە تۆودارەکان، ئەو رووەکانەی کە گوڵ یان قوچەکیان هەیە(مخروطات) رەگ و قەدو گەڵای راستەقینەیان هەیەو بەشێکی گەورە لە رووەك پێك دەهێنن ، دەنکی هەڵەو تۆو دروست دەکەن، ئەمانەش دوو کۆمەڵەن رووەکە قۆچکدارەکان و رووەکە گوڵدارەکان. |
| نباتات جفافية | Xerophytes | رووەکە وشکانییەکان، ئەو رووەکانەی کە لە ناوچە وشکانییەکان دەژین و وەکوو سوبێر |
| نبات احادي البذرة | Mono sperm | رووەکی تاك تۆو. |
| نبات بصلي | Bulbous-plant | رووەکی سەلکدار. |
| نبات حشري التلقيح | Entomo philous Plant | رووەکی مێروو ئاوس، ئەو رووەکەی کە بە هۆی مێرووەوە ئاوس دەبێت. |
| نبات معمر | Perennial Plant (Plurenmial) | رووەکی تەمەن درێژ. |
| نباتات الصخور | Petrophytes | رووەکی بەردەڵانی، ئەو رووەکانەی کە لەناو بەردەڵانیدا دەروێن. |

| | | |
|---|---|---|
| نبات مشيجي | Gametophete | ڕووەکی گەمیتی، ئەو بەشەی ڕووەك کە گەمیتەکانی تیادایە: (گەمیت - خانەی ڕەگەزیی). |
| نبات دائم الخضرة | Ever green Plants | ڕووەکە هەمیشە سەوزەکان وەکوو، سەروو سنەوبەر. |
| نبات الجبن | Cheese Plant | ڕووەکی پەنیر، ڕووەکێکی خۆهەڵواسەرە ڕەنگی هەوایی هەیە گەڵاکەی گەورەیە لە شێوەی دڵدایە هەندێك جار شەقار دەبێت، بۆ ڕازاندنەوە بەکاردێت. |
| نبات الزبدة | Butter wort | گیاکەرە، مێرووگر، گیایەکە گەڵاکەی ئەستوورو گەورەیە مادەیەکی لینج دەردەدات مێشی پێ دەگرێت، گوڵەکەی ئەرخەوانی و لاسك درێژە. |
| نبات الفراشة | Butter Fly Plant | ڕووەکی پەپوولە، گوڵەکەی سوورو سپییە. |
| نبات للعلف | Fodder Forage Plant | زرکۆ، گزرە گیا، ڕووەکی ئالف. |
| نباتات صمغية | Gummi Ferous Plants | ڕووەکە زەمقی‌یەکان، ئەو ڕووەکانەی کە کەتیرەو زەمق دەردەدەن. |
| نبات النار - انجرة - قراص كاوي | Urtica | گەزنە، بەیبوونە کێویلە. |
| نباتات سحلبية | Salepplants | سەعلەمی‌یەکان: کۆمەڵە ڕووەکێکە وەکوو مۆزو حەیزەران و زەنجەفیل. |
| نباتات الكلأ | Nomophyta = Fodder Plants | ڕووەکی لەوەڕ، ئەو ڕووەکەی کە بۆ لەوەڕ دەست بدات وەکوو سێپەڕەو وێنجە. |
| نباتات المستنقعات | Helophytes | ڕووەکەکانی زەلکاو، ئەوانەی لەناو زەلکاودا دەڕوێن. |
| نباتات صناعية | Industrial Plants | ڕووەکی پیشەسازی، ئەو ڕووەکانەی کە دەچنە پیشەسازی‌یەوە وەکوو ئەو ڕووەکانەی کە شەکر یان ڕیشاڵ یان ڕۆن یان عەتر یان ڕەنگیان تیادایە هتد. |
| نباتات الظل | Sciophytes | ڕووەکی سێبەر، ئەو ڕووەکانەی کە لە سێبەر یان هەتاوێکی کزدا دەژین. |
| نباتات غذائية | Food Plants | ڕووەکە خۆراکی‌یەکان، ئەو ڕووەکانەی کە خۆیان یان بەشێکیان لێ دەکرێت بە خۆراك وەکوو گەنەو جۆو فاصۆلیا. |
| نباتات لحمية | Succulent | ڕووەکە گۆشتنەکان، ئەو ڕووەکانەی کە قەدو گەڵاکانیان گۆشتن و ئاویان تیادایە بەرهەڵستی ووشکانی دەکەن وەکوو هەنجیری دڕکاوی (صبیر). |
| نباتات ليفية | Textile Plants | ڕووەکە ڕیشاڵدارەکان، وەکوو لۆکەو کەتان و گوش |
| نباتات مائية | Hydrophytes = aquatic = Plants | ڕووەکە ئاوی‌یەکان: ئەو ڕووەکانەی کە ئەندامی زاوزێیان لە ئاودایە. |
| نباتات مزهرة | Flowering Plants | ڕووەکە گوڵدارەکان، ئەو ڕووەکانەی کە ئەندامی زاوزێی نێرو مێیان هەیە. |
| نباح - يرح | Guib = Bush Buck | جۆرێکە لە بزنە کێوی وەکوو سەك ئەوەڕێت. |
| نباح | Scalaire | قاقلەی بچووك، سەدەفی بچووك، گیاندارێکی بچووکی دەریایی‌یە لە کۆمەڵەی سەدەف سەدەفەکەی سپی و بچووك و قۆچەکی پێچاو پێچە. |
| نباح | | قوڕە، لوورە، نووزە نوز، حەچوولور. |
| نباح - نبح | Barking | وەڕینی سەگ، حەپەی سەگ. |
| نبادة - صناعة الخمر | Wine making | شەراب دروستکردن. |
| نبال = رامي النبال | Bowman = archer | تیر ئەنداز، تیرهاوێژ. |
| نباعة | | سەری مناڵی ساوا کە هێشتا هەر نەرمە. |
| نباش | Digger | هەڵ کەند، گۆڕ هەڵکەند، چینەکەر. |
| نباش القبور | Resurrectionist | گۆڕ هەڵدەرەوە، ئەوکەسەی کە گۆڕ هەڵدەداتەوە بۆ دزینی لاشە. |
| نباهة - نبه - فطنة | Intelligence | وورییایی، زیرەکی. |

| | | |
|---|---|---|
| نباذ - بائع النبيذ | Wine merchant | شەراب فرۆش. |
| نباتي | Vegetarian | رووەك خۆر، ئەو كەسەی كە هەر لەسەر خواردنی رووەك دەژین و گۆشت و بەرهەمەكانی گیاندار ناخۆن. |
| نبت - نبتة | Plant = germination | رووەك، شینایی. |
| نبتة - مطعمة | Stiongraft | رووەكی متوربەكراو. |
| نبتون | Neptone | نیتۆن، هەستەم ئەستێرەی گەرۆكە لە نزیكیدا لە خوارەوە،(٢٩٩٧) ملیۆن میل لە خۆرەوە دوورە، تیرەكەی (٣٧) هەزار میلە، هەر (١٦٥) ساڵ جارێك بە دەوری خۆردا ئەسووڕێتەوە ،(١٧) ئەوەندەی خڕۆكی زەوی ئەبێت، ناوەكەی لە (خوداوەندی دەریا لای رۆمانەكان) وەرگیراوە دوو مانگی هەیە (تریتۆن و نیرید) بەرگێكی كەشی هەیە زۆربەی لە گازی میثانە. |
| نبتوني | Neptunian | نیپتۆنی، هەرشتێك پەیوەندی بە هەسارەی نیپتۆنەوە هەبێت. |
| نبتونيوم | Neptunium | نیپتۆنیۆم(كانزایەكی تیشكدەرە) كێشی ئەتۆمی‌یەكەی (٢٣٧) ژمارەی ئەتۆمی‌یەكەی (٩٣) كانزایەكی دەستكردە ناوەكەی لە وشەی (نیپتۆن)كە ئەستێرەیەكی گەرۆكە وەرگیراوە. |
| نبتة مستحية - ميموسا | Sensitive Plant = Humble Plant, mimosa | رووەكی شەرمن، میموسا، رووەكێكە نزیكەی نیوەمەتر بەرز ئەبێتەوە، گەڵاكانی لە پەڕی باڵندە ئەچێت، گوڵەكەی خڕو سوورە لە ئینجانەدا ئەروێنرێت. گەڵاكەی هەستكەرە، ئەگەر دەستی لێ بدرێت لوول ئەبێت. |
| نبتة الجنون - جنون البقري - مرض جاك | Loco = loco weed = locoism | رووەكی شێتی، گیا شێتانە، رووەكێكی ژەهرینە ئەگەر ئاژەڵ و وڵاخ بیخوات تووشی نەخۆشی دەماری شێتی ئەبێت.شێتی مانگا، نەخۆشی‌یەكی دەمارییە تووشی وڵاخ و ئاژەڵ ئەبێت، ئەگەر رووەكی شێتی بخۆن، پێشی دەوترێت نەخۆشی جاك. |
| نبخ | blister | تلۆق، بلۆق. |
| نبخ - جدري الضأن، كناقطة الجدري | Sheep pock = sheep pox | ئاوڵەی مەر، نەخۆشی‌یەكی درمە تووشی مەر ئەبێت. |
| نبخة - كبريتة | Lucifer = Match | قوتووە شقارتە، دەنكە شقارتە. |
| نبذة | Extract = section = port | كورتە، سەرپۆت، پوختە، پاڵاوتە. |
| نبذ - انتباذ | Centrifugation | دەركردن و فڕێدان.، دەرپەراندن. |
| نبر - شعرانة | Botfly = Gadfly = Oestridae = Warble Fly | مێش وڵاخ، مێش مەرو ماڵات، جۆرە مێشێكی مشەخۆری گەزندەیە لەسەر لەشی گیاندارو مرۆڤ ئەژی وە لەژێر پێستی ئاژەڵدا گەرا دادەنێت، وە ئەم جۆرە مێشە لەشەكەی ئەستوورو توكنەو رەنگاو رەنگە ، رەنگەكەی گەنمی‌یە، هێڵی رەش و قاوەیی تیادایە، مێتولكەكەی لەناو گەدە یان لەژێر پێستی گیانداری وەكوو وڵاخ و ئاژەڵدا دەژی و كونی دەكات. |
| نبر الضأن | Sheep bot | مێرووی مەر، مێش مەر. |
| نبر البقر | Ox bot = oxfly | مێرووی مانگا، مێش مانگا. |
| نبر الفرس | Horse bot | مێرووی ئەسپ، مێش ئەسپ. |
| نبرية | Gastrophilus | مێرووێكە كە مێشولەكەی زیان بە گیاندارە خۆماڵی‌یەكان دەگەیەنێت. |
| نبر - انبار - مخزن | Warehouse = store | عەمار، كۆگا. |
| نبرة | Accent = emphasis | (١) چاڵی لێو لەژێر لووتدا، (٢) بەرزوونزمی دەنگ، لەرەی دەنگ، تەرانەی دەنگ، تەراتینی دەنگ.(٣) جمە، جووڵە، لەرە. |

| | | |
|---|---|---|
| نبرة - ورم | Swelling | ئاوساویی. |
| نبرية | Nebria | مێروویەکی بچووکی بە سوودی رەنگاورەنگە. |
| نبراس - منوار - مصباح الشارع | Street lamp | گلۆپی سەرجادە،، گلۆپی کۆلان. |
| نبراس - مصباح | Light = lamp | چرا، چرادان،ورچاخ، پاچرا. |
| نبريج - خرطوم | Hose = Flexble = Tube | مارپێچ، بوری ئێرگەلە، نێرگەلە، سۆندە. |
| نبز | NicK name | نازناو بۆ گاڵتە پێکردن، لەقەب بۆ گاڵتە جاری، ناوو ناتۆرە. |
| نبس | Say = Speak | قسەکردن، گۆیین. |
| نبش | Digging = unear Thing = excaving | چینـەکردن، دەرهێنـانو دەرخسـتن، هـەڵکۆڵین، هەڵدانـەوەی زەوی ، ملۆموش،کچیچ کردن. |
| نبش - قلع | Rooting up | هەڵکەندنو دەرهێنان، هەڵکێشان. |
| نبش القبور | Rifling of tombs rombs roobing | هەڵدانەوەی گۆڕ، گۆڕ هەڵکەندن. |
| رنبش | | جۆرە درەختێکـە گەڵاکـەی لـە سنەوبەر دەچێت.تەختەکـەی سـوورو زۆر رەقە. |
| نبش بالحافر | | سمکۆڵە کردن. |
| نبض - نبضة | Pulse = Pulsation = Palpitation | پرتە پرت، پل لـێ دان، فرتـە فـرت، پرتـە، شـوار، شـوارق، لێدانـی بـۆڕی خوێنبەر. |
| نبضات | Beets | لێدان، پرتە. |
| نبضة شريانية | Arterial = Pulsation | پرتەی شاخوێنبەر. |
| نبض مضطرب | Irreggular Pulse | پرتەی ناڕێك. |
| نبض سريع | Celer Pulse | پرتەی خێرا. |
| نبض بطيء | Lentus Pulse | پرتەی هێواش. |
| نبض ضعيف | Debilis Pulse | پرتەی لاواز. |
| نبضة الكترونية | Electronic (eletric Pulse) | پرتەی ئەلکترۆنی . |
| نبط - غور | Depth = Profundity | ناخ، قوڵایی. |
| نبع | Spring = source | کانی هەڵ قوڵین. |
| نبع | | کەوت یان بەڵاڵوك، درەختێکە لقەکەی رەقە تیری لێ دروست دەکرێت لقەکەی زەردە ، ئەگەر بمێنێتەوە سور ئەبێ و بەرەکەی وەك قەزوانی شین وایە. |
| نبق - سـدر - زفرين | BucK Thorn, christs Thorn, zizy phus = NabK tree = honey berr = NabKa | کونـار، قـەنار، کینـار، مورتـك، تەمـەو، تـاوی تایلـە، تـاوك، درەختێکـە دڕکاوییە، هەمیشە سەوزە، نزیکەی (١٠) مەتر بەرز ئەبێتـەوە، بـەرێکی سوور یان زەردی خڕی هەیە، کەمێك شیرینە، ئەخورێت، دەنکێکی رەقی تیایە لە عەناب ئەچێت جۆرە دەرمانێکی لـێ دەردەهێنرێ بۆ نـەرم کردنـی قژ، هەندێکی رەنگ لە بەرەکەی دەردەهێنرێت. |
| نبـق اسـود - جلـهم - عوسج اسود | Alder buck Thorn = BlacK Alder | تاووگی رەش. |
| نبق مسهل - شجرة الدكن - روم | Purging bucK Thorn = cascara bucKthorn | تاووگی رەوانکەر، دەوەنێکی دڕکاوییە گوڵـی نێرو مێی هەیە گوڵەکەی مەیلـەو زەردە بەرەکـەی وردو هێلکـەییو پرتەقاڵـییە،بەرەکـەی رەشـی مەیلەو بنەوشەیی. |

| | | |
|---|---|---|
| نبــق العجــم - سنجد - سنجت | Oleaster = Jerusalm = willow = persian Jujube = Russian olive | سرێنچك، سنجوو، تاووگی عەجەم، درەختێكی دڕكاوییە نزیكەی (٧) م بەرز دەبێتەوە وە گەڵاكانی لە زستاندا ئەوەرێ، لقەكانی رەنگێكی قاوەیی مەیلەو سووریان هەیە گوڵێكی زەردو بۆنێكی زۆر خۆشی هەیە، بەرەكەی زەردو شیرینو خۆشە. |
| نبــق كــــردي - سدر كردي | Bezwalaruk bucK thorn | پارزین، لاسی، سنجوو، لازی، تاووگی كوردی، بێزوالارووك. |
| نبكة - نبوة | HillocK = a small hill = mound | بەرزەلانی، بەرزایی، تەپۆڵكە. |
| نبل | Nipple | نیپل، ئەو پارچەیەی كە دوو پارچەی بۆری پێ دەگەیێنرێت بە یەك. |
| نبل - نبالة | Nobleness | خانەدانی. |
| نبلة - نبل - نشاب - سهم | Arrow = dart | تیر. |
| نبلة - صيادة | Nobleness = Catapult | دارلاسیك. |
| نبلوس | Nauplius | (ناوپلیەس) شێوەی یەكەم لە شێوەكانی ژیانی هەندێك لە گیانداره توێكڵدارەكانی وەكوو قرژاڵو ڕۆبیان. |
| نبوءة - نبوة | Prophecy | نوقڵانە لێدان. |
| نبوخ | fermentation | هەڵهاتنو ترشان(بۆ هەویر). |
| نبــوت عصــا طويلــة = شؤمة | Cudgel = Club = Quarterstaff | مەشاك، كوتەكی گەورە. |
| نبوت (قصير) - هراوة - زقلية | Truncheon | كوتەكی بچووك، گۆچان. |
| نبي (عليه السلام) | Prophet | پێغەمبەر ، پەیامبەر (د.خ). |
| نبوي | Prophetic | پەیامبەری. |
| نبيذ - خمر | Wine | مەی ، شەراب. |
| نبيذ التفاح | Cider | شەرابی سێو. |
| نبيذ بوردو - كميت | Claret | كلارێت، شەرابی بۆردۆ رەنگەكەی سوورە. |
| نبيذ الشعير - جعة - بيرة | Beer | بیرەی جۆ. |
| نبيذ العسل - بتع | Hydromel | هایدرومێل، بیرەی هەنگوین. |
| نبيذ العنب و العسل | Honey wine | بیرەی ترێو هەنگوین. |
| نبيذ مسكي | Muscqtel | بیرەی موسكات. |
| نبيذ الأجاص | Perry | شەرابی هەڵوژە. |
| نبيذ الكمثري | Perry | شەرابی هەرمێ. |
| نبيل | Noble | جوامێر، پەسند، خانەدان. |
| نبيل | Rare | دەگمەن، نایاب. |
| نبيه - نابه | Intelligent | زیرەك، پەیتووكە. |
| نبير | cheese | پەنیر. |
| نبيش - منبوش | Excavated | هەڵكەندراو، هەڵدراوە، وەكوو گۆڕێك كە هەڵدرابێتەوە. |
| نتاج - غلة - محصول | Production = yield | بەرهەم، بەروبووم. |
| نتافة | Plucked feather depilate hair · | پرزۆل، پەڕی دەركێشراو قژی رووتاوە. |
| نتانة | Mephitis | بۆگەنی، بۆدرنی. |

| | | |
|---|---|---|
| نتح - ارتشاح | Transpiration = exudation | ئاوبەردان، ئارەق دەردان. |
| نتروجين - ازوت | Nitrogen | نایترۆجین، توخمێکی ناکانزایی بێ بۆن و بێ رەنگ و بێ تامە، ژمارەی ئەتۆمییەکەی(٢٧)و کێشی ئەتۆمییەکەی (١٤) پلەی کوڵاندنەکەی ٨و١٩٥و خەستییەکەی ٢٥و١ گم/ لیتر هاوهێزییەکەی ٣و٥ گرنگترین پێکهێنەری بەرگی کەشە، نایترۆجین زۆر پێویستە بۆ ژیانی گیانداروو رووەك لەگەڵ ئەوەشدا لە پێکهاتنی هەندێك مادەی ژەهرینی وەکوو سیانیدەکان بەشدار دەبێت. |
| نترات = نیترات - ازوتات | Nitrate | نیتریت، خوێی ترشی نیتریك ، وەکوو کالسیوم نیترەیت. |
| نترات الصودیوم - ملح بارود شیلي | Nano 3 = Caliche = sodium nitrate chile saltpetre = Chilean nitrte = Nitrate of sode | خوێی باروتی شیلی، جۆرێکە لە کەرەسەی خاو خوێی نیتراتی سۆدیۆمی تیادایە لە وڵاتی شیلیدا هەیە. |
| نترات البوتاسیوم - ملح البارود الأعتیادي - نترات البوتاسا | Kno = Potassium-nitrate | نیتراتی پۆتاسیۆم، خوێ باروتی ئاسایی. |
| نیترات الکلسیوم - نیترات الجیر | Calcium nitrate | نیتراتی کالسیوم، خوێی قسل. |
| نترات الکروم | Chromium nitrate = $Cr(no_3)_3\ qH_2o$ | نیتراتی کرۆم، مادەیەکە بەشێوەی بلووری رەنگ ئەرخەوانی هەیە، ئەگەر بشلەقێنرێت یان گەرم بکرێت دەتەقێت. |
| نترات السیزیوم Cs No3 | Cesium nitrate | نیتراتی سیزیوم، تۆزێکی بلوورییە، لە ئامادەکردنی خوێیەکانی سیزیومدا بەکاردێت. |
| نترات الکوبلت $Co(No_3)_3$ | Cobalt nitrate | نیتراتی کۆبالت، بەشێوەی بلووری سوور هەیە، لە دروست کردنی مەرەکەب و بۆیەی کۆبالت و کارکەری یاریدەر بەکاردێت دەکرێتە خاکەوە (بۆ کشتوکاڵ)و ئالیکی ئاژەڵەوە، هەروەها بۆ ئامادەکردنی ڤیتامین و بۆیەی قڕ دیکۆری پۆرسلین. |
| نترات البوتاسیوم الکوبلتي - الکوبلت الأصفر - ملح فیشر | Cobalt Potassium nitrate = Cobalt yellow = Fishers salt | نیتراتی پۆتاسیۆمی کوباڵتی، کۆباڵتی زەرد، خوێی فیشەر، مادەیەکە کە لە مەیانی پزیشکێتی و بۆیەی زەردو رووکەش کردن و شووشەو پۆرسلیندا بەکاردێت. |
| نترات السیروز - نترات السیریوم ce (Nos)3 | Cerous nitrate | نیتراتی سیرۆز، بەشێوەی بلووری بێ رەنگ هەیە، لە مەیانی پزیشکێتیداو لە قەپاغی چرای گازی گڕ گرتوودا بەکاردێت. |
| نترات البریلیوم | Berllium nitrate = $Be(No_3)_2 . 3H_2o$ | نیتراتی بریلیوم، بە شێوەی تۆپەڵی سپی یان مەیلەو زەرد هەیە وەکوو ناسەرەوەیەکی کیمیایی بەکاردێت. |
| نترات الامونیوم - ملح صخري نرویجي - نترات النشادر | Ammonium nitrate = Norway saltpeler = $(Nh_4No_3)$ | نیتراتی ئامۆنیۆم، خوێی بەردینی نەرویجی، بەشێوەی بلووری بێ رەنگ هەیە، دەشێت بە گەرمی زۆر بتەقێت، لە دروست کردنی پەین و تەقەمەنی گژو گیاو مێروکوژدا بەکاردێت. |
| نترات السلیلوز - نترو سلیلوز - قطن البارود | Cellullose nitrate | نیترات سلیلوز، $C , H_7 o_2 (oNo_2)_3$ لە دروست کردنی تەقەمەنی و لە مەیانی پزیشکێتی و مەرەکەبی چاپکردن . هتد بەکاردێت. |
| نترات الکادمیوم $Cd(No_3)_2$ | Cadmium nitrate | نیتراتی کادمیۆم، بەشێوەی پارچەی سپی یان دەرزیلە هەیە، لە رەنگ کردنی شووشەو سیرامیکدا بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| نترات الباريوم | Barium nitrate = Ba $(No_3)_2$ | نیتراتی باریۆم، بەشێوەی بلووری سپی هەیە، لە دروست کردنی سیرامیك‌و زانستی ئەلکترۆنیکداو لە دەرمانی قەلاچۆکردنی گیاندارە قرتێنەرەکاندا بەکاردێت. |
| نترات الألمنيوم | Aluminum nitrate (AL $(No_3)_3$ gH$_2$o | نیتراتی ئەلەمنیۆم، بەشێوەی بلووری سپی هەیە، بۆ جێگیرکردنی ڕەنگ لەسەر قوماش‌و دەباخ کردنی پێستەو پالاوتنی پەترۆڵدا بەکاردێت. |
| نترات الكالسيوم - نترات الجير - نيترو كالسيت - ملح بيتر النرويجي Ca $(No_3)$.2 $H_2o$ | Calciumnitrate = Lime nitrate = nitro Calcite = Nor wegian = saltpeter | نیتراتی کالسیۆم، نیتراتی قسڵ، نیتروکالسایت، خوێی پیتەری نەرویجی، بەشێوەی تۆپەڵی شێ مژی سپی هەیە‌لەئاودا دەتوێتەوە، لە دروست کردنی تەقەمەنی‌و شقارتەو ماددەی بە پیت کەرو سەرچاوەیەکە بۆ (کاربۆن ١٤). |
| نترات الرصاص | lead nitrate murcuric | نیتراتی قورقوشم |
| نترات الزئبقيك | Mercunic, Nitrate | نیتراتی جیویك. |
| نترات البزموث | Bismuth nitrate Bi $(No_3)_2$ . 5H$_2$o | نتراتی بزموث ، بەشێوەی بلووری ڕۆشنی بێ ڕەنگی بریسکە دار هەیە، تامەکەی ترشە، لە ئامادەکردنی خوێیەکانی تری بزموث‌و بۆیەو مینای بریسکەداردا بەکاردێت. |
| نترات البنزين - نترو البنزين | Nitrobenzene | نیترۆ بەنزین، چەورییەکی ژەهرینە. |
| نترات الفضة - حجر جهنم | Silver nitiate = lunarcaustic | نیتراتی زیو، سیلڤەر، نیترەیت،، بەردی دۆزەخ، جەهەنەم داشی، ماددەیەکە بەشێوەی کلۆی شێ باو لە فلیمی فۆتۆگراف و شووشەدا بەکاردێت. |
| نترید - ازوتيد | Nitride | (نیترید)، ئاوێتەیەکە لە یەکترگرتنی نایترۆجین لەگەڵ کانزایەك پەیدا دەبێت. |
| نتريد البريليوم | Beryllium nitride ($Be_3N_2$) | نیتریدی بریلیوم، بەشێوەی بلووری سپی ڕەقی ڕەتکەرەوە (عاکس) هەیە، لە وزەی ئەتۆمی‌و بەرهەم هێنانی هاوتای کاربۆنی تیشکدەرەوە (کاربۆن ١٤) دا بەکاردێت هەروەها بۆ مەبەستی بە دوو کەوتنی توخمە تیشکدەرەوەکانی تر. |
| نترید الكالسيوم $Ca_3N_2$ | Calcium nitride | نیتریدی کالسیوم، بەشێوەی بلووری قاوەیی هەیە، لە ئاودا دەتوێتەوە، گازی ئامۆنیای لێ پەیدا دەبێت، لە ئەلکهول پەیتدا ناتوێتەوە. |
| نتريت | Nitrite | نیتریت، خوێی نیتروز ئەسید وەکوو پۆتاسیۆم نیترەیت. |
| نتريت الكالسيوم Ca $(No_3)_{2.H}2_o)$ | Calcium nitrite | نیتریتی کالسیوم، بەشێوەی بلووری بێ ڕەنگ یان مەیلەو زەرد هەیە، شێ دەمژێت. |
| نترو بنزين | Nitro benzene | نیترۆ بەنزین، ماددەیەکی کیمیایی گرنگە بۆ دروست کردنی ڕەنگ، شلەیەکی زەردە بۆنی بادەمی تاڵی لێ دێت. |
| نترون | Nitron | نیترۆن، ماددەیەکی کیمیایی‌یە لە دۆزینەوەی ئایۆنی نیتراتدا بەکاردێت. |
| نتروتولووين | Nitro toluene | نیترۆ تولووین، ماددەیەکە چەند جۆرێکی هەیە شل‌و ڕەق ئەگەر هەڵ بمژرێت ژەهرە لە دروست کردنی مادە ئەندامی‌یەکان‌و بۆیەدا بەکاردێت. |
| نترو سليلوز - نترات السليلوز - نترات القطن - قطن البارود | Nitro cellulose = Nitro cotton | نیترۆ سلیلۆز، نیتراتی پۆکەی باروت، هەویرێکە لە لۆکە دەچێت، لە ئەسیتۆندا دەتوێتەوە، لە ئەنجامی تێکەڵ کردنی لۆکە یان هەویری تەختەوە تێکەلاوی ترشی نیتریك‌و گۆگردیك پەیدا دەبێت، بۆ گەلێك مەبەست بەکاردێت بەتایبەتی تەقەمەنی. |
| نترو غليسرين - نترو كليسرين | Nitroglycerine | نیترو گلیسرین، ماددەیەکە بۆ دروست کردنی تەقەمەنی، شلەیەکی دیمەن چەوری بێ ڕەنگە، بە کارەی گەرمی‌و شڵەقاندن ئەتەقێتەوە، بۆ جۆرێکی تایبەتی لە تەقەمەنی بەکاردێت، لە کارلێکی گلیسرین‌و ترشی نایتریك‌و کبرتیك دروست دەکرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| نترو فوسكا | | جۆرێکە لە پەیینی کانزایی. |
| نتران | Alternan thera | رووەکێکی کورتی سەرما بردەڵەیە، لە چیمەن ئەچێت، هەمە رەنگەیە ، لە باخچەکانا تەخشو نووسینی پێ ئەکرێت بۆ رازاندنەوە ، جۆری سووری پرتەقاڵیو سەوزی مەیلەو زەردی هەیە. |
| نترجة - نترتە | Nitration = Nitrification | نتروجین کردن، نایترۆجینین، واتا نایترۆجین بکرێتە مادەیەکی ترەوە. |
| نتريل | Nitrile | |
| نتردة | Nitriding | نایترایدینگ، کرداری نایترۆجین خستنە رووی هەندێك پۆلا بە گەرمکردن بۆ دەست هێنانی بەرگێکی پتەو. |
| نتراجين | Nitragen = nitragine | نیتراجین. |
| نتش - نتف - جمش - لزالة الشعر او الريش | Depilation | موو دەرهێنان، موو هەڵکێشان، ئاوە رووت کردن، پەڕدەرکێشان. |
| نتش | Radicle | رەگۆلکە، رەگی کۆرپەلەی رووەك. |
| نتف | | راجع (نتش). |
| نتف الريش | To PlucK Feathers | ئاوەڕووت کردن، داڕووتاندن، پەڕیتاندن، دەرکێشانی پەڕ لە لەشی باڵندە. |
| نتفة | A Pinch = a bit = little | کەمێك، چکێك، نەختێك. |
| نتل - ارتعاد | To tremble | راتەکاندن، راوەشاندن. |
| نتن الرائحة = منتن | Mephitic = stinKing | بۆدەن، بۆگەن. |
| نتـــوء = نتوءات | Extuberance = Bump A pophysis = Process = Prominece = umbo = Tuberosity ، | چوکڵە، گرێ، نووکە، بەرزایی. |
| نتوء - حشاء | Metapophysis = Mammillary Process = Mastoid Process | ئێسکی نووکەی پشت گوێ، ئێسکی لاجانك، چوکڵەی پشت گوێ، ئێسکی پشت گوێ. |
| نتوء غرابي | Caracoid Process | چوکڵەی سەوڵە، ئێسکی سەوڵە. |
| نتوء شوكي | Neoral spine | نووکەی دڕکاوی. |
| نتوء حلمي | Caruncle | زیادە گۆشت. |
| نتوء ( في الأرصاد الجوية) | Ridge | چوکڵەی نێوان دوو نزمایی (مخفف) کەش. |
| نتوء جانبي | Parapophysis | چوکڵەی لاتەنیشت. |
| نتوء عظمي | Probole | چوکڵەی ئێسکی. |
| نتوء مستعرض | Trans verse Process | نووکەی (چوکڵەی) پانی. |
| نتوء قذالي | Occipital Condyle | چوکڵەی پشتەسەر، چوکڵەیەکی دیارە لە پشتەوەی کەللەی سەردا لەگەڵ بڕبڕەی یەکەمدا جومگاوە. |
| نتوض | Peeling | توێژ هەڵ دان، توێکڵ هەڵدان. |
| نتيجة - حاصل | Result = outcome | ئەنجام. |
| نثار | Confetti | ئەو وردە کاغەزەی کە لە ئاهەنگدا دەپرژێنرێت. |
| نثر | Scattering = dissemination = Sowing | برژاندن، وەشاندن، وەکوو تۆو وەشاندن. |
| نثر - نثار - خصب | Fecundity | پیت، بە پیتی. |
| نثرة | | چاڵی لێو. |
| نثريات - متنوعات | Sundries | شتومەکی هەمەجۆرە. |

| | | |
|---|---|---|
| نثير - منثور | Scattered = sprinkled | بلاوەپێکراو، پرژێنراو. |
| نثير | Snorting | پژمینی چوارپێ. |
| نجا - صل | Naja | مارێکی ژەهرینە. |
| نجالة = نفاسة | Excellence | سەرکەوتوویی، پەسندیی، گران بەها. |
| نجاة - خلاص | Deliveance rescue | رزگاربوون. |
| نجاة - سلامة | Safaty | سەلامەتی. |
| نجاة = هرب | Escape | راکردن. |
| نجاد - منجد | Uphols-terer | فەرش چن. |
| نجار | Carpenter | دارتاش. |
| نجار اثاثات (موبيليات) | Cabinet-maker | دارتاشی موبیلیا. |
| نجارة = نجر | Carpentry | دارتاشین، دارتاشی. |
| نجاش - وردل | Welt | چەرمێکە (قایشێکە) دەخرێتە نێوان نەعلی پێلاوو رووەکەیەوە دوایی دەدورێت، چەرمێکە بۆ بەهێزکردن. |
| نجاع | | گەزنە، پەیبونە کێویلە. |
| نجام - منجم - يازرجي | Astrologer = Practiser of astrology | ئەستێرە گرەوە. |
| نجب - ازالة القلف | Barking | پاك کردن، توێکل لێ کردنەوە. |
| نجب - سليخة | Cinnamon trea | دارچینی. |
| نجب - فلين | CorK | تەپەدۆر. |
| نجد - هضبة | Slope = table land = upland = Plateau | گرد، بەرزایی، بەرزەلانی. |
| نجد - نجدة - زهرة الغمد | French nettle | گوڵە کالان، گیایەکە گوڵی بچووکی شین ئەگرێت. |
| نجد - نجادة الفرش | Upholsteryo | چنینی رایەخی ناوماڵ، وەکوو فەرش‌و بەڕە. |
| نجدة | Relief = aid = help = succour | فریاکەوتن. |
| نجذ | biting | گەستن. |
| نجر | Planing | تاشین، داتاشین، دارتاشین. |
| نجران | | گرێ زەنەی دەرگا. |
| نجرو - نرة صيفية - سرغو - نرة سكرية | Sorghum | گەنمەشامی هاوینە، گەنمەشامی شەکری. |
| نجرس - نقرس - قرس | Simulium | جۆرە مێشوولەیەکە پێوەدانەکەی ئازاری زۆرە. |
| نجز - انجاز | Achievement | جێبەجێ کردن. |
| نجس | Unclean = Impure | پیس. |
| نجس - نجاسة | Impurity | پیسی. |
| نجش | | هەڵفڕاندنی باڵندە بۆ مەبەستی راوکردن. |
| نجع - قرية صغيرة | Hamlet = small village | |
| نجف - نجة - تل | Hill | گرد. |
| نجفة - ثريا | Lustre = chandelier | ئەو پەیکەرە رازاوانەی کە لە کریستال دروست دەکرێن، گڵۆپیان تێ دەخرێت بۆ هەڵواسین. |

| | | |
|---|---|---|
| حلاء | Having large and beautiful eyes | (١) هەر ئافرەتێك چاوی گەورەو جوان بێت.<br>(٢) كچ. |
| حجر - ابن | Son = child | وەچە. |
| نجم | Star = Aster | ئەستێرە، ستێر، هەر تەنێكی رووناك لە شەودا لە ئاسماندا ببینرێت یاخود هەر تەنێك كە لە خۆیەوە رووناكی بداتەوە لە ئەنجامی ئەو كارلێكە ناوكیيانەی كە لە ناویدا روو دەدەن و دەبنە هۆی تیشكی كارو موگناتیسی لە سروشتدا، لە رۆژ بچێت هەرچەندە جیاواز بێ لە گەڵیا لە رووی قەوارەو دووریيەوە. |
| نجم متجدد | Nova | نۆڤا، ئەستێرەیەكە لە پڕێكدا بریسكەكەی پتر دەبێت، دوای ئەوە كز دەبێتەوە. |
| نجم نيو تروني | Neutron star | ئەستێرەی نیوترۆنی، ئەستێرەیەكە لە ئەستێرەی گرگنەوە پەیدا دەبێت. |
| نجم اسود - ثقب اسود - ثقوب سوداء - نجوم سوداء | BlacK holes | كونە رەشەكان، ئەستێرە رەشەكان. |
| نجم نابض - نجم خافق | Pulsar | ئەستێرەی پرتەكەر. |
| نجم مذنب - مذنب | Comet | ئەستێرەی كلكدار. |
| نجم قزم | Dwarf star | ئەستێرەی گرگن، ئەستێرەیەكە بریسكەكەی كەمە، قەبارەكەی زۆر كەمە لەبەر ئەوە خەستییەكەیان زۆرە. |
| نجم عملاق | Giant star | ئەستێرە زەبەلاح، ئەستێرەكەتە، ئەستێرەیەكی گەورەی زۆر پرشنگدارە. |
| نجم سيار، كوكب سيار | Planet | هەسارە، ئەستێرەی گەڕۆك، وەكو زەوی كە بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە. |
| نجم ثابت | Fixed star | ئەستێرەی جێگیر، ئەستێرەیەكە بەپێی جووڵەی ئەستێرەكانی دەوروپشتی جووڵەی دیاریان تیادا بەدی ناكرێت، وا دیارە ئەوەندە دوورن لە زەوییەوە جووڵەیان نادۆزرێتەوە. |
| نجم قطبي - نجمة قطبية | North star = polaris = pole star | كار، كارژۆلە، ئەزمێن، كۆ، ئەستێرەی پێتەیی، ئەستێرەی پۆل،(پولاریس) پۆل باكووری پێ ئەدۆزرێتەوە، ئەستێرەیەكی زۆر نزیكە لە پۆلی باكووری ئاسمانەوە لە تەوەرەی زەوییەوە زۆر نزیكە بریتییە لە كۆتایی كلكی كۆ هەسارەی (وورچی بچووك). |
| نجم راديوي | Radio star | ئەستێرەی رادیۆیی، چەند ناوچەیەكی سنوور دیارن لە بۆشایدا شەپۆلی رادیۆیی یان لێ دێتە دەرەوە بە تەلیسكۆبی رادیۆیی دەدۆزرێتەوە، هەروەها ئەم زاراوەیە هەندێك ئەستێرەی (وەكوو خۆر) یش دەگرێتەوە كە شەپۆلی رادیۆیی دەردەپەڕێنن كە دەشێن ببینرێن. |
| نجم متغير - نجوم متغيرة | Variable star | ئەستێرەی گۆڕاو، ئەستێرە گۆڕاوەكان، ئەستێرەیەكە بریسكەكەی بە نۆرەی (خولی) رێكوپێك دەگۆڕێت، خولی ئەستێرەی گۆڕاو لەنێوان چەند سەعاتێكو (٦٠٠) رۆژ یان زیاتردایە، زۆربەی ئەستێرەكانی گالاكس لە بریسكەو شەبەنگو پلەی گەرمی رووپی (سطحي)و قەبارەدا دەگۆڕێن. |
| نجم المساء | Evening star | ئەستێرەی ئێواران، هەر هەسارەیەكی بینراو دوای ئاوابوونی خۆر دیار نەمێنێت بە زۆریش بە هەسارەی (زوهرة) دەوترێت. |
| نجم معتم | DarK star | ئەستێرەی تەڵخ، ئەستێرەیەكە بەحاڵ دەبینرێت لەبەر كزیی رووناكییەكەی، ئەستێرەیەكی بێ رووناكییە. |
| نجمة مارقة، شهاب | Meteor | ئەستێرەی كشاو، تیرشهاو. |

| | | |
|---|---|---|
| نجم هش - زنبق البحر = نجم البحر الهش | Brittle star | ئەستێرەی خاو، گیاندارێکی ساکاری نەرمە لە دەریادا ئەژی. |
| نجم مذنب - مذنب | Comet | ئەستێرەی کلك دار، تەنێکی ئاسمانیيە بە دەوری خۆیدا ئەسووڕێتەوە ناوکێکی بچووکی هەیە خەرمانەیەکی گازی دەوری داوە کلکێکی گازی زۆر درێژی لێ بۆتەوە وەکوو ئەستێرەی کلکدارە (هالی). |
| نجم جديد = نجم متفجرة | Nova | نۆڤا، ئەستێرەی تازە، ئەستێرەی تەقیو. |
| نجم متوهج | Flare star | ئەستێرەی گڕگرتوو، ئەستێرەی پڕشنگدار. |
| نجمة الصباح | Morning star | ئەستێرەی بەیانیان، بەرەبەیان، ئەگەر هەسارەکە لە خۆرئاوای خۆردا بێت ئەوا لە بەشی خۆرهەڵاتی ئاسماندا دەبینرێت، هۆی بینینی لە سەرەتای ئێوارەو سەرەتای بەیانیاندا بەر لە خۆرهەڵات ئەوەیە کە خولگەکەی دەکەوێتە ناو خولگەی زەوییەوە وەکوو هەسارەی زۆرە (زهرة). |
| نجم عملاق | Gaint star | ئەستێرەی مەزن، ئەستێرەیەکی زەبەلاحی زۆر پڕشنگدارە. |
| نجم فوق العملاق - قلب العقرب | Antares | دڵـی دووپشـك، ئەسـتێرەی سـەروو چەتـەوڵ ئەسـتێرەیەکی چەتەوڵـە (کەتەیە) قەبارەکەی (٩٠) ئەوەندەی هی خۆرە، مەودای تیشکدانەوەکەی (٣٠٠) ملیون کیلۆمەترە. |
| نجم جديد اعظم | Super nova | سوپەرنۆڤا، ئەستێرەی نوێی مەزن. |
| نجمة الصباح - نجمة المساء | The morning star = Venus = The evining star = Venus | ڤینۆس، ئەستێرەی بەیان، ئەستێرەی ئێوارە، زێڕگۆن، زۆرە، مژ مژ، ناهید، ناهی، کاروان کوژ. |
| نجم، ثريا | pleiades | شەش ئەستێرەی درەوشاوە لە کۆ هەسارەی (کوکبة) گادا. |
| نجمان متزاوجان | Double star, binary star | دوو ئەستێرەی هاوسەر، ئەستێرەی دوانە ، دوو ئەستێرە لەسەر یەك هێڵی بینین وەکوو یەك ئەستێرە دەبینرێن ئەگەر بە تەلیسکۆب سەیر نەکرێن. |
| نجمة الشمال | North star | ئەستێرەی باکور، ئەستێرەیەکی هەتا رادەیەك بریسکەدارە، راستەوخۆ کەوتۆتە سەر پۆلی باکوری، هەروەها پێشی دەوترێت ئەستێرەی پۆلی (پۆلاریس) - polaris. |
| نجمي مختص بالنجوم | Astral | شێوە ئەستێرەیی. |
| نجمي | Astro = Asteroid = Astral = sideral | ئەستێرەیی، شتێك پەیوەندی بە ئەستێرە یان ئاسمانەوە هەبێت. |
| نجم - عكرش | Wheat grass | گیایەکە بۆ ئالیك بەکاردێت. لە کۆمەڵەی دەغڵودانە. |
| نجمية | Stellaria | رووەکێکە لە کۆمەڵەی مێخەك زۆربەی بەشێوەی گیایە. |
| نجم - ابو صندوق | Coffer Fish | ماسییە سنوقی، ماسییەکە لە کۆمەڵەی ئەستێرەیی لەشی بە پوولەکەی ئێسکی داپۆشراوە تەنها چاوو دەمو کلكو پەرەکانی لێوە دەردەکەون. |
| نجم البحر | Star Fish = Asteria = sea star | ئەستێرەی دەریا، ئەستێرە ماسی، ماسییە ئەستێرەیی، گیاندارێکی دەریایییە لە ئەستێرە ئەچێ پێنج پەلکی هەیە، هێواش ئەڕوات خۆی بڵاو ئەکاتەوە، مێش و مەگەزی لێ ئەنیشێت، ئینجا خۆی دێنێتەوە یەك و قوتیان ئەدات. |
| نجم البحر الأحمر | Red star Fish | ئەستێرەی دەریای سوور. |
| نجمية أسطر | Aster | جۆرە رووەکێکە. |
| نجمة صينية - أسطر الصين | Chinaaster | ئەستێرەی چین، رووەکێکە گوڵی جوان دەگرێت. |
| نجوم نابضة | Pulsaling stars | ئەستێرەی پرتەکەرەکان: کۆمەڵـە ئەستێرەیەکە گۆڕاون، نۆرەی کشان و کرژبوونیان هەیە دەبنە هۆی گۆڕان لە بریسکەکانیاندا، نۆرەی گۆڕانی بریسکەی ئەم ئەستێرانە لەچەند سەعاتێکەوە بۆ (٣٠٠) رۆژە. |

| | | |
|---|---|---|
| نجوم الوولفرايت | WolF Rayet stars | ئەستێرەکانی ولف رایت، ئەستێرەی زۆر گەرمن گەرمی دیوی دەرەوەیان لە (٥٠-١٠٠) هەزار پلەی کلفنە. |
| نجـوم ثنائيـة = نجم مزدوج | Binary stars = double stars | ئەسـتێرە دوانیـیـەکان، ئەسـتێرە جووتـەکان، جووتـە ئەسـتێرە، دوو ئەستێرەی نزیـكو پێکـەوە بەسـتراون بـەهۆی هـێزی یـەکتر راکێشـانی هاوبەشەوە ئەمەش وا دەکات کە بە دەوری چەقی قورسایی هاوبەشیانەوە بخولێنەوە واتە هەردووکیان بە دەوری یەك تەوەرەدا دەخولێنەوە. |
| نجوم متلازة | Multiple star | ئەستێرە نزیکەکان، کۆمەڵەیەك لە ئەستێرە ئەوەندە نزیکن لە یەکترییی وە وەکو یەك رژێمیان پێك هێنابێت وایە. |
| نجوم اقزام بيضاء | White Dwarfs | ئەستێرە گرگنە سپییەکان، بارستەکەیان نزیکە لە بارستەی خۆرەوە یان کـەمێك زیـاترە، رەنگـی زۆربـەیان بریتیـیـە لــە شـینی مەیلــەو سـپی خەستییەکەیان ملیۆنێك ئەوەندەی هی ئاوە بریسکەکەیان کزە. |
| نجوم عملاقة | Giant stars | ئەستێرە چەتوونەکان، کۆمەڵە ئەستێرەیەکن بارستەکەیان یەکسانن یـان کەمێك لە هی خۆر گەورەترن، رەنگەکانیان لەنێوان پرتەقاڵیو سوورردایە، کەمێکیان زەردن، قەبارەکانیان زۆر گەورەن، تیرەکانیـان لـەنێوان ١٠-٤٠) جار ئەوەندەی تیرەی خۆرن، خەستییەکەیان زۆر کەمە، نزیکەی بەشێکە لە ملیۆن بەشی خەستی ئاو ، تینی بریسکانەوەیان زۆر زۆرە. |
| نجوم ثلاثية | Triple stars | ئەستێرە سیانییەکان. |
| نجوى - مناجاة | Soliloquy = talking to one self | راز، گۆڕینەوەی نهێنیو سۆز. |
| نجـو - مـا يخـرج مـن البطـن، فضلات الانسان | Excrement = Feces | گوو، پیسایی. |
| نجوى - سر | Secret | نهێنی. |
| نجيب - نفيس | Excellent | شارەزا، نایاب. |
| نجيب - اصيل | Pedigree | رەسەن. |
| نجيمة | A sterold = a littlestar | ئەستێرۆکە، ئەستێرەیەکی بچووکە. |
| نجيع - مفيد - ناجح | Useful | بەسوود، بەکەڵك. |
| نجيــل - ارو | Flor in grass = Red top grass = Herd grass = quitch = Couch grass = doggxass = bent grass | گیایەکی لەوەڕە لە کۆمەڵەی دەغڵو دان. |
| نجيليات | Gramineae = Gramina | دەغڵودان، دانەوێڵە، رووەکە گەنمەیەکان، کۆمەڵە رووەکێکە تۆوەکەی یەك لەتکەییە، قەدەکەی سەوزو قیتو بۆشە وەکو گەنمو جۆ. |
| نجير - سيفون | Sea wheat grass | گیایەکە دەشتەکی لەوەڕە لە کۆمەڵەی دەغڵودان لـەناو کێڵگـەو قـەراغی رێگەدا دەڕوێت. |
| نجيل - ثيل = حشيشة الكلب - عكرش - حشيشة برمودا | Dougs grass = Couch grass = quitcK grass = Dogs tooth = bermuda grass | چیمەن، هەرێز، فریز. |
| نجيـل - عطـر - حشيشة الربيع | SPring grass | گیا بەهارە، گیایەکە لە کۆمەڵەی دەغڵودان بۆ لەوەڕ باشە گوڵێکی رەنگ فستقی ئەگرێت رەنگێکی زەردی لێ دەردەهێنرێت. |
| نحاتة | Cutting = shaving | برین، تاشین. |

نحات الحجر — Stonesotter — بەرد تاش.

نحات التماثيل — Sculptor — پەیکەرتاش.

نحال — Bee KeePing = beeman — هەنگ پەروەردەکەر، هەنگ پەروەر.

نحالة - عسالة — Hive = beehive — هەنگەژاڵ، هەنگدان، کوورەی هەنگ، پوورە ،پوورەی هەنگ.

نحالة — Bee Keeping = apiculture — هەنگ پەروەردەکردن، پیشەی بەخێوکردنی هەنگ.

نحاس Cu - نحاس أحمر — Copper — مس، پاقر،سفر،تونج، کانزایەکی یان توخمێکی کیمیاگەری یەکێشی ئەتۆمی‌یەکەی (٥و٦٣)وژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٢٩) ، کانزایەکی سووری کاڵە، ناوەکەی لە وشەی (کوپرەم) واتە (دورگەی قوبرص) وەرگیراوە، لە ئامرازی گەرمی‌و کارەبایداو لە دارشتەکاندا بەکاردێت. هاوهێزی (٢،١) هەیە، لە گرنگیدا لەدوای ئاسن‌و ئەلەمنیۆم دێت ژەنگ هەڵناهێنێت‌و داناخوریت لەبەر ئەوەی کە گەرمی‌و کارەبا بەباشی دەگەیەنێت لە دروست کردنی تەلی کێبڵ‌و تەلەفۆن‌و تەلگورافدا بەکاردێت، هەروەها لە دروست کردنی پاتری‌و پارەی زێڕو زیودا بەکاردێت، لە دروست کردنی دارشتەداو لە مەیانی چاپەمەنی‌و دارشتەی برونزو لە دروست کردنی پەیکەرو مەکینەدا بەکاردێت، مسی زەرد دارشتەیەکە لە مس‌و توتیا لە هەموو مەعدەنەکانی تر زیاتر بەکار دەهێنرێت لە دروستکردنی کەلوپەلی مەعدەنیدا، مەعدەنێکی بنەڕەتی‌یە لە رووکەش کردن بە زێڕو زیو، هەروەها لە دروست کردنی ئەم کەلوپەلانەدا بەکاردێت: قوتووی سەعات، بۆڕی‌و رادێتەری، ئوتومبێل، خشڵ‌و لەوحەی کانزایی‌و ئامرازی مۆسیقایی‌و بزمارو بنکەی زمانە.

نحاس البريليوم — Beryllium Copper — مس بریلیوم، دارشتەیەکە هەندێك جار نیکل یان کۆبالتی تیادایە زۆر قایم‌و رەقە، کارەبا زۆر بە باشی ئەگەیەنێت، لە سویچی کارەباو ئامرازی بینابیدا بەکاردێت، جۆرە باشەکەی ئەم دارشتەیە لە ٨٥٪ مس‌و لە٩٪ نیکل‌و لە ٦٪ تەنەکەی تیادایە.

نحاس أصفر — Brass — براس، مسی سپی،زەرد، سفر، ئاڵتونی درۆزنە، دارشتەیەکە لە مس‌و زینك بۆ دروستکردنی فیشەك‌و بۆمبا

نحاس - صفار — Copper smith — مزگەر، ئەو کەسەی کە لە قاپ‌و قاچاخی مسدا کاردەکات وەکوو سپی کردنەوەیان.

نحاسيك — Cupric — مسیك کوپەریك، رەوشتی هەر ئاوێتەیەکە کە هاوهێزی یان باری ئۆکسانی ئایۆنەکانی مس تیایدا (+٢) بێت.

نحاسوز — Cuprous — مسۆز باری هاوهێزی مس یەك بێت.

نحافة - هزال — Skinniness = Lean ness = Thinness = slender — لاتی، باریکی، لاوازی، لەری.

نحـام = مـرزم - سـرخاب - بشمور - بشروش — Flamingo — قازی سوور، سوورە قوڵنگ، باڵندەیەکی ئاوی مل‌و لاق درێژە، دەنووکی چەماوەیە ، لەشی پەمبەیی‌یە، توانای ئەوەی هەیە ملی پێچاو پێچ بکات، لە ئاودا خواردن پەیدا دەکات.

نحت — Sculpure — بەرد تاشین، پەیکەر تاشین.

نحر — Lower front part of necK — چاڵایی ژێر مل.

نحر - ذبح — Tokill, Slaughter — سەربڕین.

نحس - مخوس - سيء الخط — Bad luck = lucKless — بەد، غەر، قەشقە.

| | | |
|---|---|---|
| نظامي | Systematic | رژێمی. |
| نظار - شديد النظر | Having acute sigst | چاوتیژ. |
| نظارة = عوينات | Spectacles = Glasses | چاویلکە، عەینەك، چاڤك. |
| نظارة = متفرجون | Spectators | بینەران، تەماشاکەران، سەیرکەران. |
| نظارة ذات عين واحد | Monocle | چاویلکەی یەك چاو، عەینەکی یەك چاو. |
| نظارة مقربة | Spy-glass | چاویلکەی نزیك خەرەوە، دووربین. |
| نظارة فلكية، مقراب | Telescope | تەلیسکۆپ بەماناى دوور (tele) و بینینی (scops)، ئامرازێکی بۆرییانەی بینایی‌یە بۆ بینینی تەنە دورەکان وەکو مانگ و ئەستێرەکان. |
| نظارة غبار | Goggles | عەینەکی تەپوتۆز |
| نظارة المسارح | Lorgnette = opera glass | عەینەکی شانۆ. |
| نظارة ملونة | Shell | بۆ پاراستنی چاو لە تیشکی خۆرو تەپوتۆز. |
| نظارة راكبة الأنف | | عەینەکی سەرلووت. |
| نظاراتي | Glazier = glassman | چاویلکەفرۆش. |
| نظافة | Cleanness | پاکی، خاوێنی. |
| نظر | Sight locking | دیدەنی، بینین، دیتن، روانین، بینایی، رووناکی چاو. |
| نظرية | Theory | تیۆری، بیردۆزە، داوایەکە(پرسیارێکە) پێویستی بە بەڵگە هەیە بۆ سەلماندنی بیردۆز، تیۆر. |
| نظرية فرما | Fermats Theorem | تیۆری، فێرما، تیۆریی‌یە کە دەربارەی زانستی جەبر. |
| نظرية الأنفجار الأعظم | Big bang theory | تیوری تەقینەوەی مەزن،تەقینەوەی مادەیەك بلیۆنەها ساڵ لەمەوبەر بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە پارچەکانی هێشتا بە سوڕاوەیی ماون. |
| نظرية ينغ هلمهولتز في رؤية الألوان | Young Helmholtz | تیوری هیلمهولتز لە بینینی رەنگەکان دا (دەربارەی دەروونناسی). |
| نظرية جيمس لانج | James lange Theory | تیوری جێمس لانج، تیوری‌یەکە لە دەروونزانیدا. |
| نظرية العاملين | Theory of two- factors | لە زیرەکیدا دوو کار هەن، گشتی و تایبەتی. |
| نظرية الآلات | Theory of machines | تیوری ئامرازەکان، لقێکە لە لقەکانی ئەندازەی میکانیکی باسی ئەو رێسە بیرکاری‌یانە دەکات کە ئامرازەکانی لەسەر دروست دەکرێت. |
| نظري - ضد عملي | Theoritical | بیردۆزەیی، تیوری‌یانە، بیردۆزەیی یانە دژی کرداری. |
| نظرية ذرية | Atomic theory | تیۆری ئەتۆمی. |
| نظرية الميكانيكية | Mechanism theory | تیوری میکانیکێتی، ئەو تیوری‌یە کە دەڵێت مادە هەمووی لە ئەتۆم پێك هاتووە. |
| نظرية بارد كانون | Bard Cannon Theory | تیوری بارد کاندون: ناوچەی هەستی‌ی لە شێرزەیی هەروەها رەفتاری شێرزەیی لە لایەن هایپۆثالامۆرسەوە دابین دەکرێت: hypo Thalamus (ما تحت المهاد البصري). |
| نظرية الجسيمات - نظرية الدقائق | Corpuscular theory | بیردۆزەی تەنۆکەکان (وردیلەکان) لە روناکیدا (ضوء)، ئەو بیردۆزەیەی کە رووناکی بە وردیلەی زۆر بچووك دادەنێت بە خێرایی‌یەکی زۆر دەڕۆن. |

| | | |
|---|---|---|
| حـرية حيوية | Vitalist theory | بيردۆزەی زيندەگی، بە پێی ئەم بيردۆزەيە ژيان هەر پشت نابەستێت بە كرداری كيميايی و فيزيايی، بەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هێزی ژيانەی (قوة الحياة) كە لە زيندەوەرەكەدا بنەڕەتی هەيە. |
| حـرية دالتون الذرية | Dalton (atomic) theory | تيوری ئەتۆمی دالتۆن: دەقی ئەم تيوری‌يە دەڵێت، ئەتۆمەكانی يەك مادە لەيەك دەچن، بەڵام ئەتۆمەكانی مادە جياوازەكان لە يەك دەچن و لەو كاتەدا وا باو بوو كە ئەتۆم لەت نابێت. |
| حـرية ئنيشتين | Einsteins Theory | تيۆری‌يەكەی ئانيشتاين، تيوری ڕێژەيی، تيوری رادەيی، دوو بۆ دەركەوتنمان(استنتاج) لەم تيۆری‌يە بۆ دەردەكەوێت يەكەميان بارستە (كتلە)و ووزە دوو بڕی ئاڵوگۆڕن بە پێی ئەو پەيوەنديی بيركاری‌يەی كەوا لە نێوانياندا. وزە= بارستە x (خێرايی ڕووناكی). |
| نـظرية ذات الحدين | Binomial theory | تيوری دوو رادە، تيوری‌يەكە پەيوەندی بە زانستی جەبرەوە هەيە. |
| نـظرية كينيتية للغازات | Kinetic Theory of gasses | تيوری كاينيتكی گازەكان، بەپێی ئەم تيوری‌يە گەردەكانی (جزئيات) گاز بريتی‌يە لە ورديلەی ڕەقی جيڕ لە بارێكی بەردەوامدا، لە خۆيانەوە هەرچۆنێك بێت بەر يەكتريی و بەر ديواری قاپی گازەكە دەكەون. |
| نظرية فيثاغورث | Pythagoras theory | تيوری فيثاگۆرس، تيوری‌يەكە دەڵێت: لەهەر سێ گۆشەی گۆشە وەستاودا (ستوندا-قائم) ئەو چوارگۆشەيەی كە لەسەر ژێ (وتر) لای بەرامبەر بە گۆشە وەستاوەكە دروست دەبێت، دەگاتە كۆی ئەو دوو چوار گۆشەيەی كە لەسەر دوولاكەی تر دروست دەبێت. |
| نظرية المغنطيسية الكهربائية | Electeromagnetic Theory | تيوری موگناتيسی كارەبايی، بەپێی ئەم تيوری‌يە ڕووناكی بە شەپۆلی موقناتيسی كارەبايی دادەنرێت. |
| نظرية الكم | Quntum Theory | تيوری بڕ، تيوری‌يەكە لە ساڵی ١٩٠٠ دا زاناماكس بلانك دای‌ناوە، لەم تيۆری‌يەدا ماكس بلانك وای دادەنێت كە وزەی تيشكدراوە نابێت بەبێ رادە بەش بكرێت، بەڵام هەميشە بەشێوەی چەندينەی (چەندەهای) يەكەيەك هەيە پێی دەوترێت (بڕ-كم) لە دواييدا تيوری بڕ كە كۆن و ساكاربوو خراوەتە ميكانيكای بڕەوە (ميكانيكا الكم) كە تازەترين گەشەكردنە لە تيوری پێشكەوتندا لە فيزيای بيركاريیدا، بيردۆزەكەی ماكس دەربارەی تيوری بڕ لەپاڵ دۆزينەوەی ئەليكترۆن لە لايەن تۆمسۆنەوە لە ساڵی (١٨٩٧)دا بوونە بناغەيەك بۆ فيزيای نوێ. |
| نظرية كوبر نيكوس | Copernican Theory | تيۆری كۆپێرنيكۆس، تيوری‌يەكە ئەستێرەناسی پۆڵەندی نيكۆلاس كۆپێرنيكۆس لە ساڵی (١٤٧٣-١٥٤٣)دا دای ناوە: دەقی ئەم تيۆری‌يە دەڵێت كە خۆر چەقی كۆمەڵەی خۆرە، هەسارەكان بە زەوی‌شەوە بە دەوری خۆردا بە خولگەيەكی جێگير دەسوورێنەوەو مانگ بە دەوری زەويدا دەخولێتەوە، لەڕێگەی ئەم تيۆری‌يەوە زۆر لە دياردەكان بە ڕێگەيەكی ئاسان روون كراوەتەوە ئەم تيۆری‌يە جێگەی ئەو تيوری‌يە كۆنەی گرتۆتەوە كە دەڵێت، زەوی جێگير چەقی ئەم گەردوونەيە. |

| | | |
|---|---|---|
| نظرية لامارك | Lamarckism | تیوری لامارك، زاراوەیەكە بەو بیرو باوەڕە بایولوجی‌یە دەوترێت كە زانای گیانداری فەڕەنسی لامارك(١٧٤٤-١٨٢٩)لە كتێبێكدا دەربارەی گەشەكردنی زیندەوەرەكان دای‌ناوە، لامارك ئاماژەی بۆ ئەوە كردووە كە كاركەری سەرەكی بۆ ڕوودانی گەشە، گۆڕانی زیندەوەرەكەیە بەڕێگەی بەكارهێنانی هەندێك ئەندامی‌و وازهێنان لە ئەندامەكانی تر، ئەو ئەندامەی كە بەكار دەهێنرێت گەشە دەكات‌و بەهێزدەبێت بەڵام ئەو ئەندامەی كە وازی لێ دەهێنرێت دەپووكێتەوەو وون دەبێت، ئەمەش پێ‌ی دەوترێت یاسای (بەكارهێنان‌و وازلێهێنان) بۆ نموونە لامارك زۆر درێژی ملی ووشتر پڵنگ (زرافە) بۆ درێژبوونەوەی بڕبڕەی ملی ئەم گیاندارە دەگرێنێتەوە چونكە بەردەوام دەیەوێت دەمی بگەیەنێتە گەڵای درختە بەرزەكان بۆ خواردنیان، لامارك وای دادەنێت كە ئەو سیفەتانەی ئەندام دەستی دەكەوێت چی بە ڕێگەی بەكارهێنان چی بەڕێگەی پووكانەوەی لە ئەنجامی بەكار نەهێنانەوە، ئەمانە سیفەتی وەرگیراون لە ژینگەوەو ئەم سیفەتانە بەڕێگەی ژن هێنان‌و كنێبی(وراثة) لە نەوەیەكەوە دەچن بۆ نەوەیەكی تر، بەڵام ئەم تیوری‌یە لەگەڵ واقیعدا نەدەگونجا لەبەر ئەوە زاناكانی بایۆلۆجی وازیان لێ هێنا. |
| نظرية الأسس | Theory of bassis | تیوری توانەكان. |
| نظرية الرجوع الى الأصل | Atavic Theory | تیوری گەڕانەوە بۆ بنەڕەت، واتە گەڕانەوە بۆ ئەو سیفەتانەی كە وەچەكانی پێشوو لێیان دووركەوتوونەتەوە. |
| نظرية الطفرة أو التحول الفجائي | Mutation Theory | تیوری كتوپڕ گۆڕان. |
| نظرية التطور -<br>نظرية النشوء والأرتقاء | Theory of evolution | تیوری گەشەكردن. |
| نظرية داروين | Darwinism | داروینێتی، بیردۆزەی داروین، ئەو بیردۆزەی گەشەكردنەیە كە زانا تشارلز داروین دای ناوە، بەپێ‌ی ئەم بیردۆزەیە هەموو جۆرەكانی ڕووەك‌و گیاندار لە نموونەی (انماط) پێشووترەوە پەیدابوون لە ئەنجامی كردارێكەوە كە پێ‌ی دەوترێت هەڵبژاردنی سروشتی (الأنتخاب الطبيعي) بە پێ‌ی ئەم بیردۆزەیە بەرە (نەوە) یەك لەدوای یەكەكان لە جۆرێكی تایبەتی نەوەیەكی ئەوتۆ پەیدا دەكەن (دەهێننە بەرهەم) كە كەمێك جیاوازترن لەو نەوەیەی كە هێناونی‌یەتە بەرهەم، ئەو تاكە ڕووەكە یان گیاندارەی كە ڕەوشتەكانی لەگەڵ باری ژینگەدا بەباشی دەگونجێت، دەمێنێتەوەو زاوزێ دەكات، دووڕنی‌یە بەم شێوەیە دوای چەند بەرەیەك جۆری تازە بێتە بەرهەم. |
| نظرية الحركة للغازات | Kinetic Theory of gases | تیوری جوڵەی گازەكان. |
| نظرية حركية | Kinetic Theory | بیردۆزەی جووڵەیی، بەپێ‌ی ئەم بیردۆزەیە بەرزكردنەوەی پلەی گەرمی مادە ئەوەیە كە وا لە گەردەكان (جزئية) بكرێت بە خێرایی‌یەكی زۆرتر بجوڵێنەوە. |
| نظرية الأعادة | Recapitulation Theory | بیردۆزەی دووبارەبوونەوە، ئەو بیردۆزەیەی كە دەڵێت: قۆناغەكانی گەشەكردنی كۆرپەلەیی (مراحل النمو الجنيني) گیاندارێك دووبارەیە كە بۆ سەرجەمی هەمان ئەو گەشەكردنانەی كە باوو باپیرەكانی تیایدا تێپەڕ بووە هەروەها پێشی دەوترێت یاسای زایینی (زاووزێی) زیندەوەرەكان (قانون توالد الأحياء) یان مێژووی گەشەكردنی جۆر یان ڕەچەڵەك (Phylogeny) وا دەردەكەوێت كە پەیدابوونی كۆرپەلە لە مرۆڤدا، لە قۆناغەكانی گەشەكردنیدا (گەورەبوونیدا) مێژووی پەیدابوونی جۆری مرۆڤ خۆیەتی. |

| | | |
|---|---|---|
| نظرية الكوارث | Catastrophism | بیردۆزەی کارەساتەکان، دەقی ئم بیردۆزەیە دەڵێت کەوا ئەو کارەساتانەی کە تونێکڵی زەوی تووشیان بووە، لە ئەنجامی پشێویی جیۆلۆجی زۆر توندو تیژو کتوپڕەوە، پەیدابوون رووەك گیانداری زەوی یان لەناوبردووە، ئەم بیردۆزەیە پشت بە بوونی بوو بەردی (بەردەوەبووی) زۆر جیاواز ئاشکرا لە کەڤرە دوا بەدواکاندا دەبەستێت، مرۆڤ لە سەدەکانی (١٥) هەم وا(١٦) هەمو (١٧) هەم باوەری پێیان هەبووە. |
| نظرية مالثوس | Malthusian Theory | تیوری مالسۆس، دەقی ئەم تیورییە دەڵێت: کە پتربوونی ژمارەی ئادەمیزاد یان زیندەوەر بە رێژەیەکی ئەوتۆ دەبێت کە زۆر لە رێژەی زیادبوونی سەرچاوەی خۆراك زیاترە، لەبەر ئەوە بۆ نەهێشتنی رووداوی برسێتیو هەژاری دەبێت دەست بەسەر زیادبوونی دانیشتوان لە جیهاندا بگیرێت. |
| نظرية موجية الضوء | Wave Theory of light | بیردۆزەی شەپۆلێتی رووناکی، بیردۆزەیەکە وای دادەنێ کە رووناکیو تیشکە کارۆموقناتیسییەکانی تر رەوشتی جوولەی شەپۆلیان هەیە. |
| نظرية جسيمية للضوء | Corpuscular Theory of Light | بیردۆزەی تەنۆکەیی رووناکیی، بیردۆزەیەکە دەڵێت کە رووناکی لێشاوێکە لە تەنۆکەی زۆر بچووك، بەڵام ئەم بیردۆزەیە شکانەوەی رووناکی بە باشی راڤە ناکات. |
| نظرية الكم للإشعاع | Quantum Theory of radiation | تیوری بڕی تیشك، ئەم بیردۆزەیە بیردۆزەی شەپۆلی تیشك دەگرێتەوە لە لێکدانەوەی هەندێك دیاردەدا وەکوو شکانەوەو بە یەکداچوونی تیشك. |
| نظرية ايونية | Ionic Theory | بیردۆزەی ئایونی، بیردۆزەیەکە کە دەربارەی پەیدابوونی ئایۆنەکان، کرداری پەیدابوونی ئایۆن لە گەرد یان ئەتۆم، بەهەر رێگەیەك بێت بۆ نموونە وەکوو گەرمکردن، لێرەدا ئەتۆمەکە ئەلیکترۆنێك یان زیاتر وون دەکاتو دەبێتە ئایۆنێکی موجەب. |
| نظرية التولد الجرثومي | Germ Theory | بیردۆزەی پەیدابوونی میکرۆبی (جێرمی) دەقی ئەم تیورییە دەڵێت، هەموو زیندەوەرێك لە زیندەوەری ترەوە پەیدا بووەو نابێت لە مادەی نازیندوو پەیدا بووبێت، بەمە بیردۆزەی لە خۆوە پەیدا بوون لەناوچوو. |
| نظرية برنولي | Bernoullis Theorem | بیردۆزەی برنۆلی، پەیوەندی نێوان پەستانی شلە یان گازی جووڵاوەوە، لەهەر خاڵێکدا بێتو لە نێوان خێراییەکەیدا لەو خاڵەدا لێك دەداتەوە. |
| نظرية بور | Bohr Theory | بیردۆزەی بۆ هەر (بۆر) زانا (نیلز بوهر) وای دانا کە ئەلیکترۆنەکانی ئەتۆم لە ئاستی ووزەی زانراو و دیاریکراودا هەن، لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت لە ئاستێکی ووزەوە بۆ ئاستێکی ووزەی تر باز بدەن، ئەمئەلیکترۆنانە بە درێژایی مانەوەیان لە ئاستێکی ووزەی دیاریکراودا ئەووزە وەرنەگرن ئەوونی دەکەن، ئەگەر ئەلیکترۆنێك بۆ ئاستێکی ووزەی بەرزتر بازیدات، ئەوا ئەتۆمەکە وزە دەمژێت، ئەگەر بۆ ئاستێکی وزەی کەمتر بازیدا ئەوا ئەتۆمەکە وزە دەداتەوە لەبەر ئەوەی کە ئەم بازدانانە تەنها لەنێوان ئاستە دیاریکراوەکاندا روو دەدەن، بڕی وزەش هەر دیاریکراو دەبێت، لەبەر ئەوە بەم شێوەیە ئەتۆمەکان شەبەنگی هێڵی (اطياف خطية) لە وزە دەدەنەوە. |
| نظرية الخلية | Cell Theory | بیردۆزەی خانە، بەپێی ئەم تیۆرییە، پێکهاتی هەموو زیندەوەرەکان لە خانە بە رەوشتێکی گشتی هاوبەش دادەنرێت، ئەم بیردۆزەیە سەلماندوویەتی کە خانە یەکەیەکی بنەرەتیو سەرچاوەی زیندەوەرە جیاوازەکانە چونکە هەموو ئەو زیندەوەرانەی کە لە خانە پێکهاتوونخانەکانیان پێکهاتێکی گشتییان هەیە، بیردۆزەی خانە ئەوە دەسەلمێنێت کە گیاندارانو رووەکەکان لەوەدا یەکن کە یەك تۆخمی سەرەکی لە پێکهاتەکەیاندا هەیە ئەویش (خانەیە). |

| | | |
|---|---|---|
| نظير (نظائر) | Isotope | هاوتا، ئەتۆمە هاوتاكان، بريتى‌يە لە ئەتۆمەكانى يەك توخم بەلأم بە مەرجێك ئەم ئەتۆمانە چۆن يەك بن لە ژمارەى پرۆتۆن‌و ئەلكترۆن (واتە لە ژمارەى ئەتۆمدا) و خاسيەتى كيمياويدا بەلأم جياوازبن لە ژمارەى نيوترۆن‌و كێشى ئەتۆميدا، دەشێت چەند ئەتۆمێك هەبن كە ناوكەكانيان لە هەمان ژمارە لە پرۆتۆن پێك هاتبن(هەروەها هەمان ژمارە لە ئەليكترۆن) بەلأم ژمارەيەكى جياواز لە نيوترون تيادايە لەهەر ئەتۆمێكدا ئەم جۆرە جياوازانە پێيان دەوترێت هاوتاكان، ئەگەر توخمێك چەند هاوتايەكى هەبێت بەوە جيا دەكرێتەوە كە لە پێشدا ناوى توخمەكە ئينجا كێشى ئەتۆمى‌يەكەى دەنووسرێت وەكوو : يۆرانيۆم/٢٣٥ يۆرانيۆم ٢٣٨ كاربۆن/١٤. |
| نظير مشع (نظائر مشعة) | Radio active Isotope | هاوتاى تيشك دەرەوە، ئايزۆتۆپى تيشكدەر، ئەو ئەتۆمە لە يەكتر چوانەن كە گورج‌و گۆڵن لە رووى تيشك دانەوەدا، ئەتۆمى ئەوتۆ لەيەك توخمدا هەن كە ژمارەيەكى يەكسان پرۆتۆنيان تيادايە بەلأم ژمارەى جياواز نيترونيان تيادايە. پێيان دەوترێت (هاوتاكان) هەندێك لەم هاوتايانە تيشكدەرەوەن بۆ نموونە هاوتاى كاربۆنى ئاسايى شەش پرۆتۆن‌و شەش نيوترۆنى تيادايە بەلأم كاربۆن (١٤) ى تيشكدەر ناوكەكەى لە (٦) پرۆتۆن‌و (٨) نيوترۆن پێكهاتووە، وە بەهۆى ئەم ئەتۆمى تيشك دەرەوەوە دۆزراوەتەوە كە مريشك چۆن هێلكە دروست دەكات ، وە هێندێ گياندار چۆن قەڵەو ئەكرێن، وە شيرى مانگا چۆن پتر دەكرێت. |
| نظير (في الوزن) | Balanced | هاوسەنگ. |
| نظير - نظير السمت | Nadir | ئەستێرەيەكە. |
| نظير فلكي | Nadir | هاوتاى ئەستێرەوانى، خاڵێكە لەسەر خڕۆكى ئاسمانى لەسەر رێڕەوى دژ بە تەواوى لەچاو تەپڵەسەردا بۆيە: تەپڵەسەرو هاوتاى ئاسمانى‌و چەقى زەوى هەموويان دەكەونە سەر يەك هێڵى راست. |
| نظيف | Clean | پاك، خاوێن، بێگەرد. |
| نعاس | Drowsiness = Sleepiness = Doziness | وەنەوز، خەوبردنەوە، خەوەنۆتكێ، چاوچوونە خەو، چورت دان، نوقرۆسك، خەواڵووێنى چرت، خەوە خۆچكە، وێژنگ. |
| نعارة | Humming top | مزراح. |
| نعار - نغر سوري، عصفور سوري | Serin = Finch = Syrian Canary | باڵندەيەكى سەوزە لە (كەنارى) ئەچێت، دەنگى خۆشە رەنگى سەوز باوە، كەنارى سورى. |
| نعاب - نقاق | Naggy = Croaker | قيژە قيژكەر، واقە واقكەر. |
| نعاق | Cawing, caw | قيژە قاڕە. |
| نعال | Toput shoes | ناڵبەند، ئەو كەسەى كە وولاخ ناڵ دەكات. |
| نعاب | Young raven | بەچكە، قەلەرەشكە. |
| نعامة - ظليم = هودعة - روحاء - جوزق | Ostrich | ووشترمر، ووشترمەل، ووشترمرخ، باڵندەيەكە لە ووشتر دەچێت، سرك‌و گێژە، پەرێكى جوانى هەيە بۆ رازاندنەوەى جلوبەرگ بەكاردێت، گەورەترينى باڵندە زيندەوەرەكانى ئەم سەردەمەيە، هەر قاچێكى دوو پەنجەى پێوەيە، پەرى نێرەكەى رەشە بەلأم باڵ‌و كلكى پەرى سپيشى تيادايە، پەرى مێيەكەى رەنگ خۆڵەمێشى‌يە، لە ناوچە بيابانەكاندا دەژى، ئێستاكە تەنها هەر لە ئەمەريكادا هەيە، نافڕێت، بەلأم زۆر خێرا رادەكات: (٤٦ كيلۆمەتر لە سەعاتێكدا) بە هەنگاوى (٥) مەترى دەڕوات، پەڕەكەى نايابە جلوبەرگى ژنانەى پێ دەرازێنرێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| نعام استراليا = امو | Emu | ئیمو، باڵندەیەکە لە ووشتر مر دەچێت، بەڵام بچووکترە لە ئوستورالیادا دەژی. |
| نعبون | Spilornis | جۆرێکە لە هەڵۆ، سەری پەری پێوەیە، مارو مێروو ئەخوات. |
| نعجة - انثى الضان - شاة | Ewe | مەر، کاوور، کاڤر، مەری مێ. |
| نعجة برية - نعجة جبلية | | مەرە کێوی. |
| نعرة = نعر - ذبابة الحصان - ذبابة الخيل | Gadfly = ox Fly = Horse Fly = tabanid | مێشەکەرانە، مێشی وولاخ، خەرمگەز، موز، مێشمگا، مێشە سەگانە، مێشێکی گەورەی شینی تووکنە بەگیانداری چوارپێ وە ئەنیشێتەوەو خوێنەکەیان ئەمژێت و ئازاریان ئەدات، هەروەها ئەچێتە لووتی وولاخەوەو سەغڵەتی ئەکات. |
| نعرة قومية | Chauvinism | میللەت (نەتەوە) بەزل زانین. |
| نعسان = ناعس | Sleepy = drowsy | خەواڵوو. |
| نعش | Cata falque | تەرم، تابووت، دووداره، دارەمەیت. |
| نعش - سرير او خشبة الميت | Bier | تاتەشۆر. |
| نعش - تابوت - صندوق الميت | Coffin | تەرم، دارەمەیت. |
| نعض - نعضبة | Plum | دارو دەوەنێکە بەرەکەی لە گێلاس ئەچێت، وورد و سوورە ئەخورێت یان ئەکرێت بە مرەبا. |
| نعظ | Priapism | نەخۆشی‌یەکە لە کێردا. |
| نعق - نعق الغراب | Croaking = Cawing | قارە قاری قەلەرەشکە، قیژاندنی قەلەرەشکە. |
| نعل - حذاء | Sandal = shoe = boot | سۆل، پاپووچ. |
| نعل الفرس | Horse shoe | گیاریختووک، جۆرە رووەکێکە. |
| نعل الفرس | Hippocrepis = horse shoe vetch | نالی وولاخ، رووەکێکی دەشتەکی‌یە هەندێك جۆری پزیشکی‌یە. |
| نعل الخيل - نعل الدابة | Horse shoe | ناڵ. |
| نعم (انعام) | Cattle | مەڕو ماڵات، چوارپێ، ئاژەڵ، چارەوا، وولاخ. |
| نعنع - نعناع | Mint = Spearmint (mentha) | بوودینە، نەعنا، تەهتاقە، پوونگ، گیایەکی تەمەن درێژی بۆن خۆشە، ئارەقی نەعنای لێ ئەگیرێ، یاخود لەگەڵ خواردەمەنی ئەخورێت، هەندێ لە لقەکانی بەسەر زەویدا ئەکێشێت، گوڵێکی شین ئەگرێت، ئارەقەکەی ئەکرێت بە دەرمان، قەراغی گەڵاکانی گرنج گرنجە مادەی (مانتۆل) یشی لێ دەر ئەهێنرێت، بۆ دروست کردنی مەی و دەرمانی سك ئێشە سوودی لێ وەرئەگیرێت. |
| نعنع البر - نعنع الجبل - قلمنت | Cat- Mint = Common Calamint | نەعنا کێویلە، گیایەکی دەشتەکی بۆن خۆشە، گوڵەکەی بنەوشەیی‌یە. |
| نعنع الحقل - فوتنج بري - فودنج بري - دباب = فلية | Penny royal = Pudding grass | پونگە، گیایەکە لە نەعنا دەچێت. |
| نعناع بستاني | Peppermint = brandy mint | نەعنای بێستانی، نەعنای بیبەری، نەعنای پزیشکی، جۆرێکە لە نەعنا رۆنی لێ دەگیرێت. |
| نعنع الماء - فوتنج الماء - حبق الماء - ضيمران | BrooKMint = Fish Mint = Water mint = Mentha-aquatica | نەعنای ئاویی، گوڵەکەی سپی مەیلەو پەمبەیی‌یە پونگە. |
| نعنع حار | Mentha Piperita | نەعنای توون. |
| نعوظ = انتصاب | Erection | ئێرق بوون، کێر رەپکردن قیت کردن. |

| | | |
|---|---|---|
| نعومة - لين اللمس | Smooth ness = Softness | ساف= لووس. |
| نعومة الجلد | Dermalaxia | پێست نەرمی، نەرم بوونی پێست. |
| نعيب | Croaking = Cawing | واقە واق، واقە، واقاندن، قیژە، قیژەقیژ، قیژاندن، قاژە، قاژە قاژ، خوێندنی هەندێك گیاندار وەكوو قەلەڕەشكەو كونگەبەبوو. |
| نعير - صراخ | Clamour = exclamation | قیژەقیژ. |
| نعير الثيران - جؤار | Bellowing | بارە بار، بۆڕاندن. |
| نعيق - نعيق الضفدع | Croaking = Cawing | قیرەقیر، قیراندن قریواندن، قریوە. |
| نعيمة | | جۆرێكە لە برنج. |
| نعيم - صليب جنوبي | Crux | خاچی باشووری، كۆمەڵە ئەستێرەیەكە. |
| نعي - منعاة - خبر وفاة | Death announcement | بڵاوكردنەوەی (خەبەر) مردن. |
| نغاش | Pedionomus | باڵندەیەكی بچووكە رەنگەكەی قاوەیی مەیلەو سوورە هێڵی زەردو سوورو رەشی تیادایە. |
| نغاش - قزعة - قزم | Pigmy = Very small = midget | گرگن، كورتە باڵا. |
| نغاض | Wind Poppy = Flaming = Poppy | گیایەكە لە كۆمەڵەی خاشخاش گوڵی زەرد یان شین یان بنەوشەیی ئەگرێت، ناووكەكەی شیراوێكی لینجی زەردی ژەهرینە. |
| نغاض - قزع - ركام | Cumulus | جۆرێكە لە هەور، بریتییە لە چەند تۆپەڵێكی خڕ بنكەیەكی تەختیان هەیە. |
| نغاضة - اميبا - متمورة | Amoeba | ئەمیبا، گیاندارێكی سەرەتایی یەك خانەیە. |
| نغاف - ام شبقونة | Ox Pecker = Beefeater | باڵندەیەكە لە كۆمەڵەی ریشۆڵە، رەنگینە بە رەنگی قاوەیی و زەردو سوور، شوێن ئاژەڵ ئەكەوێت گەنەو مێشی سەر لەشیان ئەخوات. |
| نغبوق | Hemipode | باڵندەیەكە لە كۆمەڵەی مریشك لە سوێسكەو لە چێرگیش ئەچێت، رەنگی قاوەیی و زەردو رەشی تیادایە. |
| نغبول | Fibre Palm | جۆرێكە لە دارخورما، گەڵاكەی لە باوەشێن ئەچێت، بەرەكەی لە ترێ ئەچێت مەیلەو شین یان پرتەقاڵییە ناخورێت، سوود لە ریشاڵەكەی وەرئەگیرێت بۆ دروست كردنی پەت و كیسە. |
| نغث - جار الماء | Alnus = alder | درەختێكە لە گوێ ئاودا دەڕوێت. |
| نغر - كعيت - بلبل | Bulbul | بولبول. |
| نغر كناري - كنار | Canary = Serinus = Canaria | كەناری، جۆرێكە، لە چۆلەكە رەنگەكەی زەردی مەیلەو سەوزە دەنگی خۆشە. |
| نغز - دغدغة | Tickle = titillate | ختووكە. |
| نغف الجلد - نغفة | Bot = Bott = Hypoderma-bovis | جۆرە مێشێكە (مێروویەكە) تووشی وولاخ و ئاژەڵ ئەبێت، مێتولكەكەی لەژێر پێستیدا جێگیر ئەبێت و ئەبێتە هۆی كونبوونی پێستەكەی، هەروەها ئەچێتە دەمو گەدەو ریخۆڵەوە. |
| نغف الغنم | Cattle grub | پزوو، مێروویەكە دەدات لە مەڕ. |
| نغل | Bastard | زۆڵ، بیژی. |
| نغل - نغيل - هجين | Hybrid = bastrid | (١) زۆڵ، زۆڵەك، بیژی، بیج، (٢) دووڕەگ ئەو گیاندارەی كە باوكی لە رەگەزی دایكی نەبێت وەكوو ئێستر كە لە نێرەكەرەو ماین ئەبێت، یان لە ئەسپ و ماكەر بێت. |

| | | |
|---|---|---|
| نغمة للصوت) | Pitch = tune = melod | ئاواز، نەوا. |
| نغمة موسيقية | Musical Pitch | ئاوازی مۆسیقایی. |
| نغمة هرمونية | Harmonic tone | ئاوازی هارمۆنی: ئەو ئاوازەی کە لەرەلەرەکەی (تردد) چەندەها ئەوەندەی لەرەلەری ئاوازە بنەڕەتییەکەیە. |
| نغولة | Bastardy | زۆڵێتی. |
| نغيل | Bastard | زۆڵ. |
| نفاذ | Penetrating = piercing | تێپەڕکەر، گوزەرکەر، کونکەر. |
| نفاذ = نفوذ = اختراق | Penetration | گوزەرکردن. |
| نفاذية | Permeability | گوزەرداریی، توانایی، بەرد بۆ ئەوەی کە شلەی (ئاو) پیادا گوزەر بکات. |
| نفاخة، مثانة | Bladder | میزڵدان، میزڵدان. |
| نفاخة السمك = عوامة | Sound = Fish air-bladder | میزڵانی ماسی، میزەڵان، توورەکەیەکە لەناو سکی ماسیدا بۆ لەنگەرگرتن و بەرزو نزم بوونەوەی لە ئاودا بەکار ئەهێنرێت. |
| نفاج = فشار = مختال = مطعم بالغرور | Vaing lorious | فشەکەر، خۆ بەزل زان. |
| نفاش | Bristling up | بژکەرەوە. |
| نفاش | Sour (or) bitter arange | نارنج. |
| نفاطة | Blister | بڵق، بلوق. |
| نفاية = نفاية = نفايات | Loss = waste = offal = Garbage | پاشماوە، بەرماوە، زبڵ، سەرکۆزەر. |
| نفاس | Puer Peral, Puer Perality = Child-bed | زەیستانی، ئەو ماوەیەیە کە تێپەڕ ئەبێت بەسەر ئافرەتا دوای منداڵ بوون هەتاکوو ئەگەڕێتەوە سەرباری جارانی خۆی. |
| نفاسة | | راجع (قضة). |
| نفاثة = بخارة | Vaporizer = Sprayer | ئامرازێکە بۆ پرژاندنی شلە بەشێوەی هەڵم. |
| نفاثة كهربائية | Electrojet | ئەلیکترۆجیت، شریتێکە لە دوو شریت لە تەزووی کارەبایی لە بەرگی کەش ئایۆنراودا، یەکێکیان لە دوو ناوچە پۆلییەکان ئەوی تریان لە ناوچەی ئیستیوائی هەروەها بە چینێکی جووڵاوە لە تەنۆکەی کەش ئاوینراویش دەووترێت. |
| نفاثة (طائرة) | Jet Plane | فڕۆکەی جێت، فڕۆکەی تیژڕەو. |
| نفاض = ميدعة | Pinafore | بەروانکە، بەروانکەی منداڵان. |
| نفاضة = نسافة | Chaff | پووش. |
| نفاية الجلود | Skin Scraps | بەرماوە (پاشماوە) ی پێستە. |
| نفاية الزرع | Trash | پاشماوەی کشتوکاڵ وەکوو گەڵاو توێکڵو . هتد. |
| نفاع = نفوع | Very useFuL | زۆر بە سوود، زۆر بە کەڵک. |
| نفاق | Hypo Crisy | دوو روویی، ئاژاوە. |
| نفاضة السيكاير = منفضة السيكاير | Ash -tray | تەپڵەکی جگەرە. |
| نفاضة الفواكه | | چەڵاک، ئەو دارەی کە میوەی پێ دەتەکێنرێت لە درەختەوە. |
| نفاخ = نفاخ | Bloat | ژان، نەخۆشییەکە تووشی ئاژەڵ ئەبێت بەهۆی زۆربوونی گازەوە لە ورگیا |
| نفاحة سيكارة | | زریخمارە. |

| | | |
|---|---|---|
| نفتالين = نفثالين | Naphthalene = Naphthaline | نەفتالین، ئاوێتەیەکی ئەرۆماتی‌یە لە پێکەوە نووسانی دوو ئەلقەی بەترۆل پێک دێت، ئاوێتەیەکی لە کاربۆن‌و هایدرۆجین پێک هاتووە، لە ئاودا ناتوێتەوە، لە ئەلکهولدا نەختێك ئەتوێتەوە پلەی تواندنەوەی (٨٠)ی سەدی‌یە زوو ئەبێ بە هەڵم، بۆنێکی تیژی هەیە ، لە خەڵوزی بەردین دەرئەهێنرێت بەشێوەی کلۆیەکی سپی خڕی بریسکەدار، ئەکرێتە جل‌و بەرگەوە دژی مۆرانە، هەروەها بۆ دروست کردنی رەنگ بەکار دێت. |
| نفتين = نفثين | Naphthene | نیفتین، ئاوێتەیەکی هایدرۆکاربۆنی‌یە لە نەوتی سروشتی‌دا هەیە. |
| نفث - قشع | Expectoration | فڕێدان، هێنانەوە، وەکوو هێنانەوەی خوێن. |
| نفثا | Naphtha | نافثا ، یەکێکە لەو مادانەی کە لە نەوتی سروشتی‌دا هەن. |
| نفثينات الكالسيوم | Calcium- naphthenate | نافثیناتی کالسیۆم، بەشێوەی تۆپەڵی چیلکەیی هەیە، لە ئاودا ناتوێتەوە لە چوارەم کلۆریدی کاربۆن‌و گازۆلین‌و بەنزین‌و ئیثە ردا دەتوێتەوە، دەشێت بۆ تەقینەوە، لەو مادانەدا بەکاردێت کە دژ بە ئاون لە مادەی سرێش‌و مادەی ووشککەرەوەو مۆم‌و چیمەنتۆو وەرنیشدا بەکاردێت. |
| نفثينات الكوبلتوز | Cobaltous naphthenate | نافثیناتی کوباڵتوز، بەشێوەی تۆزی قاوەیی یان رەقی سووری مەیلەو شین هەیە لە ئاودا ناتوێتەوە، لە ئەلکهولدا دەتوێتەوە لە دروستکردنی بۆیەو مادەی ووشکردنەوەی وەرنیشدا بەکاردێت. |
| نفثول | Naphthol | نافثۆل. |
| نفث الدم | Hemop tysis | پژانی خوێن لە سی‌یەکانەوە، خوێن هێنانەوە. |
| نفج | Hatching | (١) فجوق کردن (بۆ باڵندە). (٢) هەڵهاتن، لە هێلکە ترووکان، هاتنە دەرەوەی جوجەڵە لە هێلکە. |
| نفح - نفحة الطيب - رائحة | Fragrance | بۆنی خۆش، بۆن‌و بەرامە. |
| نفحة | Odour | بۆن، بێن، هەوایەکی سارد. |
| نفحة قلبية | Cardiac murmur | وڕەی دڵ. |
| نفح | Frogrance | بڵاوکردنەوە، بڵاوبوونەوە، بەلاڵە. |
| نفخ - نفخة | Blow | دەماندن، فوودان، فووتێ کردن، فووپیاکردن، پفدان،پف، فوو. |
| نفخة البطن | Flatulence of stomach | بای سك، باکردن لە ئاژەڵدا. |
| نفر | Person, Individual | کەس، زەلام. |
| نفر - جندي بسيط | Soldier | سەرباز. |
| نفرة - رقية - عوذة - تعويذة | Spell = Charm = incantation | چاوەزار. |
| نفريديوم | Nephridium | نیفریدیۆم، گورچیلەی بچووك. |
| نفروستوم | Nephrostom | نیفروستۆم، رەحەتی‌یەکی برژانگ دارە بە هۆیەوە بۆری نەفریدیا ئەچێتەوە سەر بۆشایی لەش. |
| نفريت | Nephrite | نیفریت، بەردێکی بە نرخە جۆرێکە لە (لشیب) یان شەوە. |
| نفس | Breath | پەتۆ، بێن، بینگ، پشوو، هەناسەدان. هەناسەدانەوەو هەناسەوەرگرتن. |
| نفس كريه | Halitosis | هەناسەی بۆگەن. |
| نفس = روح | Spirit = Soul = mind = psyche | دەروون. |
| نفسي | Sychologic | دەروونی. |

| | | |
|---|---|---|
| نفساني | Psychological | دەروونی، هەرشتێك پەیوەندی بە دەروونەوە هەبێت. |
| نفسي | Psychic = Psychical | دەرونی، پێشگرێکە بە مانای دەروونی. |
| نفسي حركي | Psychomotor | دەروونی جووڵەیی، شوێنکاریی جووڵەیی لە ئەنجامی کردارەکانی ژیریی یان مێشکی. |
| نفساء | Confined = inchildbed | زەیستان. |
| نفش | Bristling up | بژکردنەوە، بڵاوکردنەوە، شیکردنەوە. |
| نفض = فرط | Beating | وەراندن، هەڵ وەراندن، وەرین، تەکاندن، تەکاندنی درەختی میوە. |
| نفض الثوب | To shaKe agarment | تەکاندن، هەڵ تەکاندنی جلوبەرگ، بۆ ئەوەی خۆڵی پێوە نەمێنێت. |
| نفض الشجرة | To shaKe Fruit down From atree | تەکاندنی درەخت، هەڵوەراندنی میوە. |
| نفض الجوز | Beating nut | وەرزەشای، وەزشای، تەکاندنی دارگوێز. |
| نفضي - نفصية | Deciduous | گەڵاوەریو، رووەکی گەڵاوەریو، ئەو رووەکانەی کە هەموو ساڵێك گەڵاکانیان دەوەرێت (بەتایبەتی لە زستاندا). |
| نفضة = رعدة الحمى | Ague | لەرز یان تا. |
| نفط = نفطة | Naphtha | نافثا، نەوت، بریتییە لە تێکەڵاوێك زوو دەبێت بە هەڵم.دەشێت بۆ سووتان لە دڵۆپاندنی پەترۆڵ. دەستگیر دەبێت لە گازۆلین دەچێت، بۆ روونکردنەوەی بۆیەو وەرنیش بەکاردێت هەروەها لە پاککردنەوەی وشکدا (التنظيفات الجاف) بەکاردێت. |
| نفط اسود | BlacK oil | نەوتی رەش. |
| نفط ابيض | Kerosine = Kero sene | نەوتی سپی، کیرۆسین. |
| نفط طبيعي - نفط خام | Naphtha = Petroleum | پەترۆل، شلەیەکی خەستی رەشباوە لە ناخی زەوی دایە لە گوشینی گیانەوەرێك کە ناوی فۆرامینیفرایە پێك دێت یا لە گوشینی ئەودارستانانەی کە ئەکەونە ژێر زەوییەوە. |
| نفطة = نفاطة = مجلة - فقاعة | Blister = Vesicle | بلۆق،تلۆق، تامێسك، زیپکە، پیزوکە، پرزك، ئاوڵك، بلۆقی سەرپێست. |
| نفع - فائدة - ربح | Use = utility | سوود، کەڵك. |
| نفق | Tunnel | تونێل، رێگەیەك بە ژێر چیایەکدا بڕوات. |
| نفق | Tunel = drift | تونێل، کونتیلە، قەنتەر. |
| نفق هوائي | | تونێلی هەوایی، ئامرازێکی گەورەی بۆشی لوولەییە ،هەوایەکی زۆر خێرایی پیادا تێپەڕ دەبێت، بۆ تێپەڕکردنی هەوا بەسەر فڕۆکەدا بەکاردێت. |
| نفقة = نفقات | Expenses | پارەی پێویست بۆ خەرج کردن. |
| نفقة المعيشة | Cost of living | تێچوونی گوزەران، تێکڕایی ئەو پارەیەی کەسێك یان خێزانێك لە خواردنو جلو بەرگو هاتووچۆ و رێگاو بانو . هتد خەرجی دەکات. |
| نفقة الزوجة المطلقة أو المنفصلة | Alimony | مەسرەفی (نەفەقەی) ژنی تەڵاقدراو. |
| نفل = نفلة = شبذر - حندقوق | Clover = Trefoil = ShamrocK = Yellow melilot = Sweet clover = Gift weed | شەوەر، کنێر، نەفەل، سێ پەرە، سێ بەلگ، گیایەکە گەڵاکەی سێ پەلکی هەیە گوڵەکەی سپی یان پەمبەیی یان زەردە، بۆنێکی خۆشی هەیە گوڵەکەی شیلەیەکی شیرین دەرئەدات لەوەرێکی باشە بۆ ئاژەڵ، هەروەها بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| نفل ارجواني | Reserved TreFoil = Persian Clover | سێ پەڕەی ئەرخەوانی. |
| نفل البر - رجل الأرنب | Field clover = Hares Foot Clover = stone Clover | سێ پەڕەی دەشتەکی، گوڵەکەی پەمبەیی‌یە. |
| نفل اسكندري - قرط - برسيم - قصيفصة | Egyptian Clover = Berseem = winter-lucerne | وێنجە، یونجە، بۆ لەوەڕ باشە. |
| نفل الماء - برسيم الماء | Bog bean = BucK- bean = Marsh Trefoil | سێ پەڕەی ئاوی، گوڵەکەی سپی مەیلەو پەمبەیی‌یە، بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت، وێنجەی ئاوی. |
| نفل المروج - برسيم أحمر | Red -Clover = Purple- Clover = Meadow-Clover | سێ پەڕەی بنەوشەیی، گوڵەکەی بنەوشەیی‌یە. |
| نفنف - هواء | Atmusphere, atmosphere | هەوا، کەش. |
| نفنوف = ثوب المراة | Dress = ladys grown | کراسی ژنانە. |
| نفوسكوب | Nephoscope | نیفۆسکۆپ، ئامرازێکە بۆ چاوەدێری کردنی ڕێ ڕەو و خێرایی با. |
| نفور - هروب | Flight = Fleeing | تەرەبوون، تۆران، سرکی، سڵ کردنەوە، سڵەمینەوە، ڕاکردن. |
| نفوذ | Penetration = going Through | چوونە ژوورەوە، تێپەڕکردن، سمین، گوزەرکردن. |
| نفوق | Dying of animal = death animal | تۆپینی گیاندار. |
| نفير = بوق | Horm = Trumpet | بۆقی، شەیپوور، زوڕنایەکی گەورەیە. |
| نفير = جماعة | Group = Company | کۆمەڵ، کۆمەڵە، بە کۆمەڵ. |
| نفير عام | | چوونی هەموو میللەت بۆ جەنگ. |
| نفية - سفط - سلة | Basket | سەبەتە. |
| نفي - انكار | Denial = refuting | نینکارکردن. |
| نفيلين - نفيليت | Nepheline = Nephelite | نیفیلاین، نیفیلایت، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی ئەلەمنیۆم ڕەنگەکەی سپی‌یە یان بێ ڕەنگە پەڵەی سەوز یان قاوەیی یان خوڵەمێشی تیادایە، مەعدەنێکە بریتی‌یە لە سیلکاتی سۆدیۆم و ئەلەمنیۆم لە بەردە ئاگرینەکاندا هەیە. |
| نفيلينيت | Nephelinite | نیفیلینایت، کەڤرێکی گڕکانی‌یە ڕەنگەکەی تۆخە. |
| نفيس | Precious = Costly | بەنرخ، نایاب، بەها. |
| نفيطة | Blister | بلۆق، تلۆق. |
| نقاش | Painter = Designer | نەخش کار، شێوەساز. |
| نقاش - جدال | Controversy | گفتوگۆ. |
| نقاشة - حرفة النقاشة | Engraving = Painting | نەخش کردن. |
| نقاء = نقاوة | Purity | پاکی، بێگەردی. |
| نقالة | Stretcher = Litter | دارەتەرم، دارەمەیت. |
| نقالة | Wheel barrow = Conveyor = Carrier | گالیسکەیەکی دەستی‌یە یەك پێچکەی هەیە مرۆڤ بۆ گواستنەوەی شتومەك بەکاری ئەهێنێت. |
| نقالة لحمل المرضى - سيارة اسعاف | Ambulance | ئوتومبیلی فریاکەوتن. |
| نقاهة | Analepsy = Convalescence | بوژانەوە، چاك بوونەوە لە نەخۆشی ماوەیەکی کەم دوای چاك بوونەوە لە نەخۆشی، قترمسین. |

| | | |
|---|---|---|
| نقـر | Engraver = Carver | بەردتاش، بەرد هەڵکەن. |
| نقـارة | Engraver = carver | بەردتاشین. |
| نقـاب | Veil | ڕووپۆش، سەرپۆش، پەچە. |
| نقابة تجارية | Syndicate = Corporation | سەندیکای (نیقابە) بازرگانی. |
| نقابة تعاونية | Guild | سەندیکای هەرەوەزی. |
| نقابة عمال | Trade union = labor union | سەندیکای کرێکاران، یەکێتی کرێکاران. |
| نقابة زراعية | Farmers union = agricultural syndicate | نەقابەی کشتوکاڵی. |
| نقارية - نقارة - نقرزان - نقيرة | Kettle drum | تەپڵ، دەهۆڵ. |
| نقافة - نبلة - صيادة | Catapult | دارو لاستیك، قۆسك. |
| نقاق - ضفدعة | A Frog = Croaker | بۆق، گیاندارێکی تەڕ و وشکییە. |
| نقانق | Fried(or) roasted | خواردەمەنییەکی سوورەوەکراو. |
| نقابة | Syndicate | جڤـات، نەقابـە، پیشـەگە، کۆمـەڵێك لـە خـاوەن پیشـە، یـان هونەرمەندەکان، بەشێوەی کۆمەڵێکی هەرەوەزی بۆ پاراستنی ماڵی هاوبەشی خۆیان. |
| نقاب الورق | Leaf miner | مێروویەکە لە شانەی گەڵا زیندووەکاندا دەژی کونیان دەکات. |
| نقاطة - قطارة | Dropper | دڵۆپێنەر، وەکوو هی دەرمانی چاو. |
| نقاط الألم | Pain Spots | خاڵەکانی ئێش، چەند خاڵێکی لەسەر پێست هەست کردنیان بە ئێش و ئازار کەمترە وەك لە هەست کردنی خاڵەکانی دەوروپشتیان. |
| نقاط الضغط | Pressuer Spots | خاڵەکانی پەستان، چەند خاڵێکی لەسەر پێست هەست کردنیان بە ئێش و ئازار کەمترە وەك لە هەست کردنی خاڵەکانی دەوروپشتیان. |
| نقاط اصلية للبوصلة | Cardinal Points of The compass | چوار خاڵە سەرەکییەکەی قیبلەنما. |
| نقاز | | نەخۆشییەکی ئاژەڵە لە دەردەگا ئەچێت. |
| نقاز | Penelopes | جۆرە باڵندەیەکە دەنووکی چەماوەیە، سەری پەڕی پێوەیە، ڕەنگەکەی قاوەییە، بەشێوەی کۆمەڵ (پۆل) ئەژی. |
| نقار امريكي | Klicker | کونکەرە، باڵندەیەکی ئەمریکییە. |
| نقار اخضر | Green wood pecker | دارکونکەرەی سەوز. |
| نقار التين | Fig pecker | هەنجیر خۆرە، جۆرە باڵندەیەکە. |
| نقار الشوك - حسون | Gold Finch | باڵندەیەکی جوانە لە کۆمەڵەی ڕیشۆڵە، ڕاودەکرێت و دەخرێتە قەفەزەوە لەبەر جوانی و دەنگ خۆشی. |
| نقار - نقار الخشب - قراع - ناقوبة | Wood pecKer-picus | تاق تاق کەرە، دارکونکەرە، دارەسمە، دارەتەقێنە، دارەکەوە باڵندەیەکە دەنووکی ئەستوورە (لەهەنگ خۆرە) ئەچێت، بە درەختدا هەڵ ئەگەڕێت، کرمەکەی ئەخوات، هەروەها لقی درەخت کون ئەکات و هێلانەی تیا ئەکات. |
| نقاض | Drosophylium | ڕووەکێکە گەڵاکەی مادەیەکی لینجی پێوەیە مێرووی پێوە ئەنووسێت ئەمیش ئەیمژێت وە لەناوی ئەبات و گوڵەکەی زەردە. |
| نقاية - نواة الثمرة | Stone | ناوکی بەری درەخت وەکوو ناوکی هەڵوژە. |
| نقاعيات | Infusoria | گیاندارە پڕۆتۆزۆڵ دارەکان وەکوو پارامیسیۆم، لقێکە لە گیاندارە نزمە سەرەتاییەکان. |

| | | |
|---|---|---|
| نقب العين | | چارەكردنی ئاوی رەش لە چاودا. |
| نقبة - تنورة | Petticoat = Skirt | تەنورە، بەشێكە لە جلی ژنانە. |
| نقت | | دەرهێنانی مەغزی ئێسقان. |
| نقح | To revise = rectify | بژاركردن. |
| نقد | critisizm | مەرِی قاچ بچووك. |
| نقد(نقود) | Notes = Money | پارە، دراو، نەختینە. |
| نقد ورقي | Currency note | پارەی كاغەز. |
| نقد(نقود) معدنية | Metalic money | پارەی مەعدەنی، ئەو پارەیەی كە لە مەعدەنی وەكوو: زێڕ یان زیو یان نیكل یان برۆنز، دروست ئەكرێت. |
| نقدا | Ready = Cash | یەك ژەمی. |
| نقدة - تقدة - كرويا | Caraway | كەراویا، ڕووەكێكی كشتوكاڵی‌یە لە كۆمەڵەنی بەهارات. |
| نقر | | سمكۆڵەكردن. |
| نقر | To tnock | لێدان، پەلەپیتكە، كون كردن، بە پەلەپیتكە،لێدان پل لێدان. |
| نقرة - مقبس | Socker | چاڵ، سۆكت، ئامرازێكی بۆشە. |
| نقرة | Foveola = Fovea = Pit | چاڵ، قووڵكە، كون. |
| نقرة | Mortising | درزی تەختە كە زمانەی تێ دەخرێت. |
| نقرة الذقن | | چاڵی چەناگە. |
| نقرة الذراع | | بەرەنگڵ. |
| نقرة | | نەخۆشی‌یەكە تووشی ئاژەڵ ئەبێت پێی خوار دەكات. |
| نقرة - مرة | Bitter Pit or Stippen | نەخۆشی‌یەكە ئەدات لە بەری سێو. |
| نقرة العنق | Nuch, nape | بۆقەتەی مل. |
| نقر الدف | To knocK The drum | دەف، لێدان، تەپڵ لێدان. |
| نقرس - داء الملوك = داء المفاصل | Podagra = Gout = arthritis | نەخۆشی جومگە، ئاوسانی جومگەو پەنجە گەورەی پێ، نەخۆشی پاشاكان، نەخۆشی‌یەكی بە ئێشو ئازارە لە ئەنجامی سووتانەوەی جومگەكانەوە ڕوودەدات- جومگە ئێشە. |
| نقرس الصلب أو ألمه | Rachisagra | ئێشو ئازاری بڕبڕەی پشت. |
| نقرس القدم | Podaga | جومگە سووتانەوەی پێ. |
| نقرس الكتف | Omagra | جومگە سووتانەوەی شان. |
| نقرس اليد | Chiaragra | جومگە سووتانەوەی دەست. |
| نقرس المرفق | Pechyagra | جومگە سوتانەوەیئانیشك. |
| نقرس الركبة | Hamar thritis = scelodesmus | جومگە سووتانەوەی ئەژنۆ. |
| نقرس المفاصل | Hamarthritis | جومگە سوتانەوە. |
| نقرس - نجرس - قرس | Simulium | جۆرە مێشوولەیەكە پێوەدانەكەی ئازاری زۆرە. |
| نقرس - سكيت - سويكتة - برغش | Gant | مێشوولەیەكی بچووكە. |
| نقريس - طبيب ماهر | A clever doctor | دوكتۆری كارامە. |
| نقس سخام | Soot = Smut = CrocK | رەشی مەنجەڵ یان چرا، دووڕینج، دوو ژینگ،هێس، تەنی. |
| نقش | Paint = dapple | نەخش، نیگار. |

| | | |
|---|---|---|
| نقشارة | Willow warber = Chiff chaff | جۆرە باڵندەیەکی بچووکی رەنگینە بە زەردو قاوەیی. |
| نقص | Hamartia | کەمی، بەدیی. |
| نقص غذائي | Deficiency disease | کەم خۆراکی، بەدخۆراکی. |
| نقص - نقصان - قصور | Decrease = Deficiency = Lack = Atelo | کەمی. |
| نقص البروتين | Protein deficiency | کەمی پرۆتین لە خۆراکدا. |
| نقص الفسفور | Phosphorus deficiency | کەمیی فۆسفۆر لە خۆراکدا. |
| نقص الفيتامينات | Vitamin deficiency | کەمی ڤیتامین لە خۆراکدا. |
| نقص المغنيسيوم | Magnesium deficiency | کەمی مەگنیسیۆم لە خۆراکدا. |
| نقص اليود | Iodine deficiency | کەمی یۆد لە خۆراکدا. |
| نقص الحساسية | Hypothymia | کەمیی هەستایەتی، کەمیی وەڵامدانەوەی شپرزەیی (تدني الأستجابة الأنفعالية). |
| نقص الكريات الحمراء في الدم | Aglobulia = Aglobulism = Hypocytosis = Oligocy Themia | کەمی خڕۆکە سورەکان لە خوێندا. |
| نقص الكريات البيض في الدم | leuko- penia | کەمی خڕۆکە سپییەکان لە خوێندا. |
| نقص اوكسجين الجسم | Anoxia | کەمی ئۆکسجین-ی لەش. |
| نقص المخاط | Amyxa | کەمی چڵم. |
| نقص الكالسيوم في العظام - نزكلة | Decalcification = calcium-deficiency | کەمی کالسیۆم، دەرهێنانی یان ونبوونی کالسیوم یان ئاوێتەکانی لە ئێسك یان لە خاکدا. |
| نقص التغذية | Cacotrophia = Athrepsia = Hypotrophy Hypothermia = undernou-rishment = Denutration | کەمی خۆراك. |
| نقص كمية الدم | Oligemia | کەمی بڕی خوێن. |
| نقص كمية العرق | Oligidria | کەمی بڕی ئارەقە. |
| نقص افراز الصفراء | Oligocholia | کەمی زراوز |
| نقص المني | Spermacrasia | کەمی سپێرم. |
| نقص العرق | Adiaphoresis, diaphoresis | کەمی ئارەقە. |
| نقص اللعاب | Aptyalism = Aptyalia | کەمی لیك. |
| نقص السكر في الدم | Hypoglycemia | کەمی شەکر لە خوێندا |
| نقص اليوريا في الدم | Hypouremia | کەمی یۆریا لە خوێندا. |
| نقص حرارة الجسم | Hypothermia | کەمی گەرمی لەش. |
| نقص عقلي | | کەم ژیری، مێشك ناتەواو. |
| نقصان الفهم | Acatalepsy | کەمی تێگەیشتن، کەم تێگەیشتن. |
| نقصان التهوية | | کەم بایی، کەمی هەوا گۆڕکێ. |
| نقصان كتلي | Mass defect | کەمی بارستەیی، جیاوازی نێوان کۆی بارستەی پرۆتۆن و نیوترۆنی ناوکی ئەتۆمو بارستەی گشتی ئەو ناوکە، هۆی ئەم کەمییە ئاشکرایە لە بارستەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وزەی بەستنەی کە پێکهێنەرەکانی ناوك دەبەستێت بە یەکەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| نقض | To undo = To refute | رووخاندن، رماندن، هەرفاندن، تێكدانەوە، هەڵوەشاندنەوە. |
| نقط - سلمون مرقط | Trout | تەرووتە، جۆرێكی پەڵەدارە لە ماسی‌یە سلێمانكە. |
| نقطة | Point = dot | خاڵ، نووكگە، نوختە، پنت، نوقتە، نیتكە. |
| نقطة التقاطع | Section point | نوختەی (خاڵی) یەكتر بڕین. |
| نقطة التماس | Tangent point | خاڵی چیغ كردن. |
| نقطة الأرتكاز | Support point = Fulcrum | زمانە، نوختەی راگیربوون، نوختەی لەسەر وەستان، پنتی راگیر. |
| نقطة الندى | Humidity or moisture point = dewpoint | ئەو پلە گەرمی‌یەیە كە هەڵمی ئاو تیایدا خەست ئەبێتەوە بۆ ئاو ئەو پلەی گەرمەیەی كە تیایدا كەش (جو) بە هەڵمی ئاو تێردەبێت. |
| نقطة الألتقاء | Meeting Point | خاڵی بەیەك گەیشتن، پنگەی بەیەك گەیشتن. |
| نقطة الأنصهار | Fusion point = melting point | خاڵی شلەوەبوون، ئەو پلەی گەرمی‌یەیە كە مادەیەك لەژێر پەستانی كەشی پێوانەییدا دەگۆڕێت لەباری بەستندا (انجماد) بۆ باری شلەیی بۆ نموونە پلەی شلەوەبوونی ئاو لە پلەی سفری سەدییدایە. |
| نقطة الأنجماد | Freezing point = Coagulation ponit | نوختەی بەستن، پنكەی بەستوو، ئەو پلەی گەرمی‌یەی كە تیایدا شلە دەبێت بە بەشتوو(رەق)، بۆ نموونە خاڵی بەستنی ئاو دەكاتە سفری سەدی یان ٣٢° فەهرنهایتی. |
| نقطة الغليان | Boiling point | خاڵی كوڵان، ئەو پلەی گەرمی‌یەی كە تیایدا لەژێر پەستانی كەش پێوانەییدا، شلە دەبێت بە هەڵم، خاڵی كوڵانی ئاو دەكاتە (١٠٠°) سەدی یان (٢١٢°) فهرنهایتی). |
| نقطة الخمود | Quiet plont | نوختەی دامركان، پلەی دامركان. |
| نقطة التحول | Change point | نوختەی گۆڕان. |
| نقطة الأنطلاق - منطلق | Starting point | نوختەی دەرپەڕین. |
| نقطة الأستناد | Support point | نوختەی راگیربوون، نوختەی لەسەر وەستان، پنتی راگیربوون. |
| نقطة الليونة | Softening point | خاڵی نەرمی ، ئەو پلەیەی كە تیایدا مادە لە باری رەقی‌یەوە دەگۆڕێت بۆ باری نەرمی. |
| نقطة الوميض | Flash point | خاڵی رووناكی خێرا، خاڵی رووناكی تەقیو، ئەو پلەی گەرمی‌یەی كە تیایدا شلەی شیاو بۆ سوتان هەڵمێك دەهێنێتە بەرهەم ، ئەو هەڵمە كە لەگەڵ هەوا تێكەڵ دەبێت دەبێتە تێكەڵاوێكی تەقیو. |
| نقطة كوري | Curle point | خاڵی كوری،ئەو پلەی گەرمی‌یەی كە تیایدا ئەو مادەیەی كە گوزەرداری‌یەكەی (انفاذية) بۆ موقناتیسێتی ، موقناتیسێتی‌یەكەی ون دەكات. |
| نقطة حضوع | Yelld point | بچووكترین هێز یان ئەرك ببێتە هۆی چەماندنەوەی یان درێژكردنی یان گۆڕان لە شێوەی تەنێكدا. |
| نقطة الأصل | Origin | خاڵی بنەڕەت. |
| نقطة عمياء - بقعة عمياء | Blind point | خاڵەكوێرە، كوێرەخاڵ، لەسەر تورێنەی چاو هەیە وێنەی لەسەر دەرناكەوێت. |
| نقطة الأنعكاس | Point of reflection | خاڵی رەت بوونەوە لە زانستی رووناكیدا ،ئەو خاڵەیە كە تیشك تیایدا رەت دەبێتەوە ئەگەر بەر رووەكی رەت كەرەوە بكەوێت. |
| نقطة البؤرة | Focal point | خاڵی تیشكۆ، ئەو خاڵەی كە زەڕەبینێك یان ئاوێنەیەكی چەماوە ئەو تیشكی رووناكی‌یە تەریبەی تیادا كۆدەكاتەوە كە دەكەوێتە سەری. |
| نقطة التشبع | Saturation point | خاڵی تێربوون، ئەو خاڵەی كە تیایدا گیراوە ناتوانێت بڕێكی زیاتر لە مادە تواوەكە بتوێنێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| نقطة ثلاثية | Triple point | خاڵی سیانی، ئەو پلەی گەرمیو پەستانەی کە تیایاندا دەشێت مادەیەکی تایبەتی بە دۆخی بەستوویی (جامد) یان شلی یان گازی بێت لە هەمان کاتدا. |
| نقطة الانتهاء - حد النهاية | End-point | خاڵی کۆتایی، ئەو خاڵەی کە تیایدا بڕێک لەترش لەگەڵ بڕێک لە تفت هاوهێز (متکافیء) دەبن. |
| نقطة الاتصال - تشابك الأعصاب - نقطة الاشتباك العصبي | Synapse | خاڵی گواستنەوە، ماوەی نێوانی دوو شانەی دەماری، پارچەی دەماری، پەترۆکی دەماری، گەیێنەری دەماری، بۆشایی نێوان ریشاڵە دەمارییەکان لە مەغزی دڕکاوییو مێشکو لەشدا. |
| نقطة حرجة | Critical point | نوختەی لارەسەنگ، پنتی لەنگیز، پنتی شڵۆق. |
| نقطة للترقيم | | ( : ) دوو خاڵە. |
| نقع البذور | Steeping of Seeds | خوساندنی تۆو بۆ ئەوەی توێکڵەکەی نەرم بێت. |
| نقع | Maceration = Infusion | خووسان، خووساندن، نماندن. |
| نقع - تعطين | Retting | خوساندنی قەدی گوشو کەتان بۆ لابردنی مادەی پەکتینیو زەمقی لە ریشاڵەکانیان. |
| نقع الزهر | Enfleurage | خوساندنی گوڵ لە رۆندا بۆ دەرهێنانی عەترەکەی. |
| نقف - فصع | Enucleation | کون کردن، هەڵ کۆڵین، ناوەرۆك دەرهێنان. |
| نقف، فرخ الدجاج | Chicken | جووجك، جووجوڵە. |
| نقف - تفقيس | Hatching | ترووکان، هەڵهێنان، هەڵهێنانی هێلکە. |
| نقل | Transter Fe = transport | گواستنەوە، گوێزانەوە. |
| نقل - دبش | Rubble = stone | وردەبەرد. |
| نقل - مكسرات | Nuts | نوقوڵ، چەرەس،شەوچەرە، ئاجیل. |
| نقلي - بائع النقل - جواز | Nut-merchant | نوقوڵ فرۆش، چەرەس فرۆش. |
| نقل - عقبة | Dessert | میوەو حەڵوا کە دوای نان خواردن بەکاردێت. |
| نقل الدم | Transfusion of blood | گواستنەوەی خوێن لە مرۆڤێکەوە یان گیاندارێکەوە بۆ یەکێکی تر. |
| نقل الجلد | | گواستنەوەی پێست. |
| نقل الأغراس | Transplanting | گواستنەوەی شەتڵ. |
| نقة-نقاهة، شفاء | Recovery | چاك بوونەوە لە نەخۆشی- ماوەی دوای چاك بوونەوە لە نەخۆشی. |
| نقة - ناقة | Convalecent | کەسێك تازە لە نەخۆشی چاك بووبێتەوە. |
| نقوة - نقاوة | Dest = select | خوڵاسە، پوختە، پاڵاوتە. |
| نقوط الزواج - جلوة | Present wedding | دیاری ژن هێنان. |
| نقوس - نخل الشمع - نخل شمعي | Wax palm | دارخورمای مۆمی، جۆرێکە لە دارخورما بەرەکەی گەورەو بنەوشەییە، ئاوەکێکی مۆمی لێ ی دەردەهێنرێت بۆ مەبەستی پیشەسازی. |
| نقي - خالص | Pure | پاك، پژوێن، خاوێن، چاك، زرنگ، بێ گەرد. |
| نقي - مخ العظم | Marrow = medulla | مۆخی ئێسقان، مەغزی ئێسقان. |
| نقيصة - عيب | Defect = blemish | کەموو کوڕی، کێماس. |
| نقيب - رئيس | President | سەرۆك، سەرەك. |
| نقيض - عكس | Contrary to = opposite | دژ، پێچەوانە، بەریەرچ. |
| نقيع - نقوع - منقوع | Infusion | خوساوە، لە ئاوکراو، نمایی، وەکوو خووساوەی رووەکێکی پزیشکی لە ئاوی گەرمدا. |

| | | |
|---|---|---|
| نقيع القمح | Infusion of wheats | دانووله. |
| نقيع الزبيب | Infusion of raisins | خۆشاو، خۆشاف، خۆشاوی مێوژ. |
| نقيع الملح | Pickling brine | خوێ ئاوك، خوێ یاوك، بۆ پاراستنی گۆشتو سەوزە. |
| نقيب | President = Chief = head man | نەقیب، سەرۆکی پیشەگە، |
| نقيق | Croafing | قرەقرِی بۆق، قیرەی بۆق. |
| نقيق البطن | Torumblein | قۆرەی سك. |
| نقير - نقر - سرة | Hilum, microple | کونوچکە، کونی بچووك، کونی گەرا کە تۆوی نێرەی لێ ئەچێتە ژوورەوە، کونی تۆ و کە ئاوی لێوە هەڵ ئەمژێت. |
| نقير | | جۆرە مێشێکی بەسوودە. |
| نقيعات - نقاعيات | Infusoria | گیاندارە نزمەکان وەکوو قامچی دارەکانو پەرامیسیۆم. |
| نكات | A vocet = A voset | نککینە، باڵندەیەکی ئاوی لاق درێژە، دەنووکێکی رەشی درێژی کەوانەیی هەیە بۆ سەرەوە، چەماوەتەوە لە شێر ئەچێت، پەرەکەی رەشو سپییە (بەڵەکە). |
| نكات - منكت | Carper = acritic = Caviller | نوکتەباز. |
| نكاح - زواج | Coitus = marriage | ژن هێنان، جووت بون، پەرین، پرۆسەی بەیەکگەیشتن، جووت کردن. |
| نكاح اليد - استمناء باليد - جلدة عميرة - ضرب الجلق | Mastur bation, Masturbation | دەستپەر. |
| نكاح فمي | Buccal Coitus | لە دەمەوە گاین، بەدەم گاین. |
| نكازة | | جۆرێکە لە برنج، برنجی کوردی، برنجی نەگازە. |
| نكاس - انتكاس | To have a replace | گەڕانەوەی نەخۆشی بۆ کەسێك دوای چاك بوونەوەی جاری یەکەم. |
| نكـاف - نكـاف - التـهاب الغدة النكفية - ابو كعب | Branks, mumps Angla parotidea = parotitis = Mumps | ملە خرێ، گوێ رەپانە، ئاوسانی لووی لیکی ژێر گوێچکە. |
| نكبة | Calamity = disaster | نەهاتی، کارەسات، ئاسێو، فەتارەت. |
| نكباء، عاصفة | Tempest = stormy wind | گەردەلوول. |
| نكتة | Banter = rally | گاڵتە، قشەگاڵتە، دەمەتەقێ، گاڵتەو گەپ. |
| نكتة - نقطة | Speck = Spot | خاڵ. |
| نكث، مخالفة | Breach | پەشیمان بوونەوە، پاشگەزبوونەوە. |
| نكح في الدبر - لواطة | Sodomy = homo sexuality | هەتیوبازی، بەچەبازی. |
| نكد - كدر | Trouble-unhappiness | ناخۆشی، دڵ تەنگی. |
| نكد | Peevish = petulant | دڵ تەنگ، بێ شانس. |
| نكرة | Indefinate | نەناسراو، نەزانراو. |
| نكر - نكران | Denial | ئینکاری کردن. |
| نكرز - نخيرة - بلاء العظم | Necrosis = gangrene | گانگرینا، نەخۆشییەکە لە ئێسکدا. |
| نكز - نكاز - نزع الماء | Deaquation = dehydration | ئاو لێ دەرهێنان، ئاو لابردن، وشك کردنەوە. |
| نكس | | |
| نكس | Invert = reverse | هەڵ گێڕانەوە، سەرەو خوارکردن، شکستی. |

| | | |
|---|---|---|
| نكسة المرض | Palincos resis = Neochmosis = Recidivation | نوشوستی دوای نەخۆشی. |
| نكش - نكاش | Digging = to dredge a well | شیکردنەوەو بژارکردنی زەوی، دەردانی بیرو زێراب. |
| نكص - نكول | To recoil = retreat | پاش گەزبوونەوە. |
| نكعة | Tragacanth = Hymenium = Pileus | (١) کەتیرە (٢) کلاوی قارچك، چەتری قارچك. |
| نكف - نكفة - غدة نكفية | Parotid-gland | لووی لیك، لووی ژێرچەنە، لوویەکی بچووکە، لە کۆتایی شەویلگەدا لەژێر نەرمایی گوێچکەدا. |
| نكف - ابو كعيب | Parotiti mumps = epidemic(or) infectious | ملە خڕێ، نەخۆشی‌یەکە. |
| نكفي | Parotic | نزیك گوێچکە. |
| نكلة | Nickel = twomills = half penny | میکل ، پارچە دراوێکە دەکاتە پێنج سەنت-٠/١ ی قرشی میسری. |
| نكل - قيد شديد | A strong tie (or) Feller | بەستەرێکی بەتین ( قایم). |
| نكل - حديد اللجام | Bitofa birdle | ئاسنی لغاو. |
| نكهة | Flavour = relish = aroma = tang | تامی خۆش، تامو بۆنی خۆش، بۆنو بەرامە، تام. |
| نكوص | Regression | وەچە بەرەو ئەوە ئەڕوات سیفەتی وای هەبێت کە بە تەواوی لەهی دایكو باوکەکەی ئەچێت بەڵکو ناوەنجی بێت لە نێوانیاندا، بۆ نموونە ئەو ئەسپە رەسەنانەی کە بەرەو مێرگەکانی ئەمەریکا رایان کردووە سیفەتی کێوی‌یان بۆ گەڕاوەتەوە. |
| نلك | | بەلالووك، بەلالوکە کێویلە. |
| نلك - زعرور | Haw thorn | گوێـژ درەختێکی بەردارە، بەرەکەی خڕو بچووکە زەرد یان سوورە دەخورێت. |
| نلمبو - نيلوفر - بشنين | Egyption bean = nelumbo = nenuphar = great white water lily | نیلوفەر، لیلۆپەڕ، گیایەکە رەگەکەی ئاوی‌یە گەڵاکەی زۆر گەورەو خڕە، جاری وا هەیە تیرەکەی ئەگاتە مەترێك گوڵەکەی زەردە یان پەمبەیی بۆن خۆشە، بەرەکەی خڕە تۆوەکەی مادەی نیشاستەی تێدایە ئەخورێت. |
| نما - صوابة - قملة صغيرة | Nit = little louse | رشك، میتوولکە. |
| نماء - نمو | Growing develope ment | گەورەبوون، گەشەکردن. |
| نماة | Trichodectes | مێرووبەکە لەپێستی گیانداری ماڵی‌دا دەژی. |
| نمام - نمام الملك - سعتر امرط - سيسنبر - سعتر بري | Thym- glaber = wild thyme = creepingThyme | سیس، عومەر، رووەکێکە دەنکەکەی وەکوو ، رەیحانە، بۆنێکی خۆشی تیژی هەیە، وەکوو بەهارات بەکاردێت. |
| نمت الغنم | Tufted horse shoe vetchy | گیایەکە بۆ لەوەڕو بۆ مەبەستی پزیشکی باشە. |
| نمة | | مێرووبەکە لەسەر لەشی ئاژەڵ ئەژی زیانی پێ ئەگەیەنێت لە سێ ئەچێت. |
| نمة - قملة | Louse | ئەسپێ، مێرووبەکی زیانبەخشە. |
| نمر - نمر | Panther = Leopard | پڵنگ، گیاندارێکی درندەیە لە کۆمەڵەی گوربە، پێستەکەی پنکە پنکەی رەش‌و سپی‌یە، لەشێر بچووکترە، بازی دوور ئەدات. |
| نمر مسيف الأسنان | Saber tooth tiger | پڵنگی ددان شمشێری، جۆرە پڵنگێکی قڕتێ کەوتووە ددانەکانی درێژو کەمێك چەماوەبوو لەشێوەی شمشێردا بوون. |
| نمر مخطط - ببر - اسد هندي | Tiger | بەور،پڵنگی هێڵدار. |
| نمر ابيض - يربيسي | Snow leopard irbis | پڵنگی سپی، لە شاخە هەرە بەرزەکانی ئاسیادا دەژی. |

| | | |
|---|---|---|
| نمرة - فزارة - انثى النمر | Shea leoperd | پلنگی مێ. |
| نمر البحر - اسد البحر | Walrus | پلنگی دەریا، شێری دەریا، گیانداری‌کی دەریاییە دوو کەلپەی درێژی هەیە. |
| نمرة | Number | ژمارە، پلە، نومرە. |
| نمر | Cirrocumulus | هەورێکی بەرزە لە پارچە پارچەی بچووك نزیك بە یەکتری پێکهاتووە، لە خوری دەچن. |
| نمرق - وسادة | Cushion = Pillow | سەرین، بالیف. |
| نمرية - خنفساء نمرية | Tiger beet | قالۆنچەی پلنگی، جۆرە قالۆنچەیەکە مێش و مەگەز ئەخوات. |
| نمرس - خزاف | China-shop Keeper | فەخفوری فرۆش. |
| نمر امريكي مرقط - جاكوار - يخور | Jaguar | جاکوار، بەورێکی پەڵەدارە لەناوچە گەرمەکانی ئەمەریکادا دەژی. |
| نمر هندي | Indian Leopand | بەور، پلنگی هیندی. |
| نمس | Rancidity | گۆڕانی تام و بۆنی رۆن و خراپ بوونی. |
| نمس - فأر فرعون | Mongoose = ichneumon | بانەوانك، بان بانکە، مریشك خۆرە، گیاندارێکە لە دەلەك ئەچێت، پەلەکانی کورتن و کلکی درێژە، سەری قوچەکی و چاوی سورە، رەنگەکەی قاوەیی یان رەشە، پێستەکەی بە نرخە مریشك و مشك و مار ئەخوات. |
| نمس مسكي | Mink | بانەوانکی بۆنخۆش. |
| نمس مصـري - فارة فرعون | Egyptian = mongoose Ichneumen | بانەوانکی میسری، رەنگی زەردە قاچی رەشە. |
| نمسية | Ichneumon Fly | مێروویەکی بە سوودە لە کۆمەڵـەی بـاڵ پەردەییـەکان مێتولکـەکانی مێرووی تر دەخۆن. |
| نمش - تنميش | Etching | ماڵەکردن،پەڵەکردن، دەرخستنی پێکهاتی مەعدەنێك بەکارکەری کیمیایی وەکوو ترشێك یان هەر دۆزەرەوەیەك(رابەرێك) ی کیمیایی. |
| نمش - كلف | Freckles = Dartre = lentigo = Ephelis = Petechia = small brownish spots in the skin | پەڵە، ماڵە، منجەڵ، شلی، منجلـی، پەڵەی رەشـی مەیلـەو سوور، ماڵـەی دەم و چاو. |
| نمص - أسل - سمار | Rush | زەل، گیایەکە لە زەلکاو زۆنگاودا ئەڕوێت گەڵاکەی باریك و درێژە حەسیر و سەبەتەی لێ دروست دەکرێت. |
| نمص | Drawing out the hair | موو هەڵکێشان. |
| نمط ظاهري | Phenotype | تەرزی یان شێوازی دیار روالەت یـان ئاشـکرا، ئـەو دیمەنـە روالەتیـەی زیندەوەر کە لە پێکهاتی زگماکیەوە پەیدا دەبێت. |
| نمط - اسلوب - طور | Style | تەرز، شێواز، شێوە، رێڕەو. |
| نمط غذائي | Dietary pattern | تەرزی خۆراکی. |
| نمط وراثي | Genotype | تەرزی یان شێوازی زگماکی، پێکهاتی زگماکی زیندەوەر کە هەموو جینە زاڵەکان و جینە شاراوەکان دەگرێتەوە. |
| نمط حيود لاويي | Laue diffraclion Pattern | نموونەی (شێوازی) لادانی لاویی:– شێوازی لادانی لاویی زانا ماکس فۆن لاوی لە ساڵـی (١٩١٢) راستیی ئەم دوو بیردۆزەیەی سەلماند:–<br>١– تیشکی سینی تیشکێکی روناکیە شەپۆلەکەی زۆر کورتە.<br>٢– ئەتۆمەکانی بلوور لە یەکەیەکی رێکوپێکی سێ دووریدا (ثلاثية الأبعاد) ریزدەبن. |

| | | |
|---|---|---|
| نمل - نملة | Ant | مێرووله، مرووچه، مێری، جۆره مێروویەکە خواردەمەنی کۆ ئەکاتەوە، شاری هەیە، توانای بۆنکردنی هەیە. |
| نمل توكانديرو | Tocandero ant | تۆکاندیرۆ، جۆره مێروویەکی ژەهرینە. |
| نمل احمر - شمشم - جعبي | Red Ant | مێرووله‌ی سوور. |
| نمل فرعوني | Pharaon ant | مێرووله‌ی فیرعەونی، مێروولەیەکی بچووکە لە شوێنی سەختدا هێلانە دەکات. |
| نمل اسمر | Dun ant = brown ant | مێرووله‌ی قاوەیی. |
| نما امغر - سمام - نمل جسور - جفل - دعابة - دعبوب | BlacK ant | مێرووله‌ی رەش. |
| نمل مدمي - جثلة | Robber ant | مێرووله‌ی دز، خۆراکی مێروولەکانی تر دەخوات. |
| نملة الرمل | Sand ant | مێرووله‌ی لم. |
| نمل - تنميل | Creepiness | مێروولەکردن وەکوو یەکێك ئەندامێکی لەشی مێرووله بکات. |
| نملية | Meat safe | دۆلابی تۆڕبەند، دۆلابی موبەق کە تەل پێوەبێت بۆ پارێزگاری خواردەمەنی لە مێش و مەگەزو مێروو. |
| نمل ابيض - ارضة - نمل الخشب | White ant = termites | تەختە کالۆس، لێوەنگ، مێرووله‌ی سپی، قەرەوەنە، مێروولەیەکە لەسەر تەختە دەژی و زیانی پێ دەگەیەنێت. |
| نملة - اكزيما | Eczema | ئەگزیما، نەخۆشی‌یەکی پێستە. |
| نملة جدري - حية | ChicK Pox Vaticella = water pox | مێکوتە. |
| نملة صغيرة | little ant | مووچە، مرچۆڵە، مێروولەیەکی بچووکی رەشە. |
| نملة حصادة - حثلة - جفل | Harvest ant | مێرووله‌ی دروێنە، مێروولەیەکی رەشی گەورەیە. |
| نملة عسل | Honey ant | مێرووله‌ی هەنگوین، جۆرێکە لە مێرو هەندێکی لە هاویندا شلەیەکی شێوە هەنگوینی عەمار دەکات بۆ خواردنی مێروولەکان لە زستاندا. |
| نمنم - نمنمي | Cannibal | دێو، خێو، درنج، ئەرژەنگ، مرۆڤێك گۆشتی مرۆڤێکی تر بخوات. |
| نمنومة - شرك الذباب | Campion = Catch Fly | مێش گر، رووەکێکە مادەیەکی لینج دەردەدات مێرووی پێوە دەنووسێت. |
| نمنمة - صعوة - سكسوكة | Regulus = wren | فیرنە گوله، فیسقەگوله، کرکرك، چۆلەکەیەکی بچووکە. |
| نمنام | TicK of birds | چنگنە، مێروویەکە لەسەر پێستی باڵندە دەژی. |
| نمنة | | هونەری وێنە گرتنێکی وورد لە لاپەڕەی کتێبێکی دەستنووسدا. |
| نمنمة - ترتر - لمع | Spangles | پوولەکە، زەنگیانە. |
| نمو | Increase = Growth = develop ment | گەورەبوون، گەشەکردن، باڵاکردن، زیادکردنی قەوارەی لەش لە هەموو لایەکەوە بەشێوەیەکی سروشتی رێك و پێك. |
| نمو اقتصادي | Economic growth | گەشەکردنی ئابوری. |
| نمو الأظافر الى الداخل | Acronty | گەورەبوونی نینۆك بۆ دیوی ناوەوە. |
| نمو لولبي | Circumnutation | گەشەکردنی زەمبەلەکی وەکوو لە رەگی رووەکدا کە زەوی کون دەکات. |
| نموذج - لنموذج | Sample = Model = example | نموونە. |
| نموذج بدئي - طراز اول | Proto type | نموونەی سەرەتایی، تەرزی سەرەتایی، شێوە بنەڕەتی‌یەکەی زیندەوەر بۆ نموونە تەرزی یەکەمی (شێوە بنەڕەتی‌یەکەی) ئەمەنگ گیاندارێکی چوار پێ بووە لەسەر زەوی ژیاوە. |
| نميزيا | Nemesia | نمیزیا، رووەکێکی گوڵدارە. |

| | | |
|---|---|---|
| نميص | Protonema | پرۆتۆنيمـــا، يەكـــەم شـــت كـــە لـــە رووەكـــدا دەردەكـــەوێت واتـــە دەزووى يەكەمدەزوويەكى سەوزە لە چەكەرەكردنى قەوزە يان چوزەولەوە پەيدا دەبێت. |
| نندنية | Nandina | نانديـنا، دەوەنێكى بۆ رازاندنەوە دەروێنرێت. |
| ننسوك | Nain socK | نەنسووك، جۆرێكە لە قوماش موسلين. |
| ننشوة - نـانخواه - خلـة = صقلين - خلة | PicK tooth = Tooth-picK | نانخولز، حەوينج، دلرسيواك، رووەكێكى گيايى دەشتەكىو كشتوكاڵىيە گوڵەكەى لەشێوەى چەتردايە لە زەوى بە ياردا دەروێت، گوڵەكەى سپىو بۆنخۆشـە لاسـكى گوڵەكـەى بـۆ سـيواك كـردن باشـە، گـەلێك دەرمـان لـە تۆوەكەى دەردەهێنرێت بۆ چارەكردنى ژانە سكو باكردنو ميزكردنو بەرد فڕێدان، دەكرێتە نانەوە تامو بۆنى خۆش دەكات. |
| ننكين | NanKeen | نانكين، قوماشێكى قايمە. |
| نهار | Young bustard | بەچكە چێرگ. |
| نهار | Day | رۆژ - ئەكاتە (١٢) سەعات. |
| نهارية، يومي، نهاري | Diurnal birds of Prey | رۆژەكى، باڵندە گۆشت خۆرە رۆژەكىيەكان واتا ئەوانەى بە رۆژ ئەگەڕێن. |
| نهاري | Diurnal | رۆژى، رۆژانە، بەرۆژ. |
| نهاز الفرص | Opportunist | هەل پەرست. |
| نهاء، بارافين | Paraffin | پارافين، مۆمێكى سپى رەقە لە نەوت دەردەهێنرێت. |
| نهاب | Plunderer | راو رووت كەر، دز، تاڵانكەر. |
| نهاش | Snappish | قەپكر، قەپاڵگر. |
| نهاة - ودع | Cyprea | سەدەف، پەيكەرێكى بچووكى رەنگاو رەنگە. |
| نهاكة = نهك | Exhaust | كەشەك، شەكەت، ماندوبون. |
| نهام - بوم | Nyctala = owl | كوندەبەبوو، بايەقوش. |
| نهائي، أخير | Terminal | كۆتاى،دوايى، دوا. |
| نهاية | End = Limit = lerminus | پايان، ئاكام، ئەنجام، كۆتايى، دوايى،دوماهى، بنەتا، بنەبڕ. |
| نهاية الصلاحية | Expiry date | مێـژووى تـەواو بـوون، ئـەو مێـژووەى كـە ئيـتر دەرمـان تيـايدا بـە كـەڵك نامێنێت. |
| نهاية عظمى | Maximum | ئەوپەڕى گەورەيى، ئەنجامى گەورە ، كۆتايى مەزن (گەورە). |
| نهاية ارضية | Earth terminal | كۆتـاى زەوىيانـە كۆتاييەكـە لەسـەر لەشـى مەكينەيـەك يـان دەزگايـەك ئامادە دەكرێت بۆ گەياندنى بە زەوى. |
| نهاية عصبية | Nerve Ending | كۆتايى دەمارى. |
| نهاية صغرى | Minimum | ئەوپەڕى بچووكى، ئەنجامى بچووك، |
| نهاس - اسد | Lion | شێر. |
| نهاء - رخام شفاف | Marid | مەڕ مەڕ. |
| نهاش | Snapper | ماسىيەكى دەريايى كەتەى دڕندەيە. |
| نهب | Plunder = Loot | تاڵان، رووتاندنەوە، راوو رووت، دزين. |
| نهج - اسلوب | Course = method | رێباز، رێو شوێن، شێواز، |
| ن . هـ . ج | I . L . S | ئاى ئێل ئێس، كورتەى دەستە واژەى (رژێمى دابەزين بە دەزگا). |
| نهدة - نهيد - نهيدة | Butter | كەرە، نيڤشك. |
| نهد - شيء مرتفع | Elevation | بەرزبوونەوە، شتێكى بەرز. |

| | | |
|---|---|---|
| نهد - ثدي | Breast = Full grown broast | مەمك، مەمك كردن. |
| نهر | The river = Eridanus = nahr | رووبار، كۆمەڵە ئەستێرەیەكە. |
| نهر | River = water stream | رووبار، زێ. |
| نهر مصفر | Braided stream | رووباری پرچی، ڕێبازێكی ئاوییە دەبێت بە چەند كەناڵێكەوە بەچەند دوورگەیەك لە یەكتری جیا دەبنەوە. |
| نهر جليدي - مجلدة | Glacier | رووباری سەهۆڵی. |
| نهري | Fluvial | رووباریی، زێیی، هەرشتێك پەیوەندی بە رووبارەوە هەبێت. |
| نهزة - فرصة | Occasion opportunit | هەل. |
| نهس - صرد اصفر - صرد - دغناس - دقناس | Red-backed shrike = Butcher bird | دارتەقێنە، جۆرە باڵندەیەكە لە چۆلەكە گەورەترە سەرو دەنووكی گەورەن، زۆر هارو هاجە چۆلەكەو گیانداری بچووك دەخوات. |
| نهش | To bite = snap | قەپ گرتن، قەپاڵ گرتن. |
| نهض - نهوض | Rising | هەستان. |
| نهضة - انتعاش وتحرك | Awakenin | راپەڕین. |
| نهق | Catheturus | باڵندەیەكی گەورەی سەرو مل رووتاوەیە باڵەكەی بێ هێزە، رەنگەكەی قاوەیی هێڵی زەردو زیوی تیایە، لە عەل شیش ئەچێت. |
| نهق - مرة - جرجير الماء | Water cress | كوزەڵە كویز. |
| نهق - نهيق، نميق الحمار | Bray of an ass | زەڕین، زەڕە، زەڕاندن. |
| نهق - جرجير بري - ايهقان | Wild rocket | تەرەتیزە كێویی. |
| نهك | Exhaustion | ماندوێتی، شەكەتی. |
| نهكة - ضنى - هزال | Exhaustion | ماندوێتی، لاوازێتی. |
| نهك حراري | Heat haustion | ماندوێتی گەرمی، جۆرێكە لە خۆرەنگازیی لە سووری خوێن دەدات. |
| نهل - شرب | To drink | خواردنەوە. |
| نهم - شراهة الأكل | Gor mandism | زۆر خۆری، بخۆری، چاو برسێتی،چاو چڵێسی، نەوسن. |
| نهم - شرة | Glutton = gourmand | زۆرخۆر، بخۆر، چاوبرسی، چڵێس، دەریالووش، نەوسن، سك بەر،چاوچنۆك. |
| نهو - انجاز | Inishing = Completing | جێبەجێ كردن، تەواوكردن. |
| نهوض | Get up | هەستان. |
| نهي - نهاء - زجاج | Glass = rockcry | شووشە. |
| نهير | Rivuletstal | چەم،چۆم، زێ. |
| نهيك - أبو مقص - ثاقب الأذن | Ear-wig | گوێ كونكەرە، سۆلسۆڵە، مێروویەكی پانكولەیە لە سیسرك ئەچێت، لە پاشەوەی لەشیدا دوو موكێش (ملقط)ی كەوانەیی هەیە، هەندێك كەس وا دەزانێت كە دەچێتە گوێچكەوە كونی دەكات. |
| نهيق | Braying | زەڕین، زەڕەزەڕ، زەڕینی كەر. |
| نهية، وعي | Consciousness | هۆش. |
| نواة | Stone = nucleus | ناووك، ناڤك، كاكل. |
| نواة - لب | Nucleus | ناووكی خانەی گیاندارو رووەك. |

| | | |
|---|---|---|
| نواة - كب | Kernel | كرۆك، كاكڵە. |
| نواة البذرة - عجمة | Stone = Kernel = endocarp | ناوكی رەق، كاكل، ناوكە رەقەكەی هەندێك میوە وەكوو ناوكە قەیسی، تۆوی رووەك كە توانای رووانی هەیە. |
| نواة (الذرة) | Nucleus | ناوكی ئەتۆم، ناووك بریتی‌یە لەو بەشەی كە ئەكەوێتە ناوەڕاستی ئەتۆمەكەوە، قەوارەكەی یەكجار بچووكە، بەلآم كێشەكەی نزیكی كێشی ئەتۆمەكەیە، بارگەكەی موجەبەو ناووك بریتی‌یە لە چەند پرۆتۆن وە چەند نیترۆنێك كە ووزەیەكی مەزن بەستوونی بە یەكەوە. |
| نواة كبيرة | Meganucleus = Macronucleus | ناوكە گەورە، ناوكێكی گەورەیە لە خانەی رووەكدا فرمانی سەوزی (خضري) خۆراكی دەبینێت. |
| نواة صغيرة | Micronucleus | ناوكە بچكۆلە، ناوكێكی بچووكە لە خانەدا فرمانی زاوزێ (زۆربوون) دەبینێت. |
| نواة الخلية | Endoplast = nucleus | ناوكی خانە، ناوك لە زۆربەی خانە زیندوەكاندا لە ناوەڕاستدایە شێوەكەش بە زۆری خڕ یان هێلكەیی‌یە، هەرچەندە هەندێك جار بەشێوەیەكی ئەلْقەیی یان لوولەیی هەیە، خانە بە زۆری یەك ناوكی تیادایە، بەلآم خانەش هەیە كە دوو ناوكی تیادایە وەكوو خانەی پەرامسیۆم، خانەش هەیە ناوكی تیادا نی‌یە وەكوو هی خڕۆكە سوورە پێگەیشتووەكان(ناضجة)، فرمانی خاڵە ئاڵۆزە ئەو بەشە گرنگەیە كە كردارە زیندەگی‌یەكان ناو خانە رێك دەخات ئەگەر ناوك نەمێنێت خانەكەش دەمرێت،چونكە ناوك چەند مادەیەك دەردەداتە ناو سایتۆپلازم، هەروەها ئەو كاركەرانەی تیادایە كە رەوشتی كنێتی (صفات وراثية) دەگوێزنەوە لە نەوەیەكەوە بۆ نەوەیەكی تر ، لە كاتی زاوزێدا، لە كاتی كرداری دابەش بوونی خانەدا ناوەڕۆكی ناوكەكە دەبن بە هێڵی درێژ پێیان دەوترێت (كرۆمۆسۆمەكان). |
| نواة متحركة | Kinet nucleus = Amphinucleus | ناوكی جووڵەكەر، ناوكی بزێو . |
| نواة مركزية | Paranucleus | ناوكی چەقی |
| نواة اولية - نواة بدائية | Pronucleus | ناوكی سەرەتایی. |
| نواة ذكرية | Male nucleus | ناوك (نێر). |
| نواة نقيرية | Hilum nucleus | ناوكی كونۆچكە. |
| نواة مشعة | Radiator nucleus | ناوكی تیشك دەر. |
| نواة قطبية | Polar nucleus | ناوكی پۆڵی، ناوكی جەمسەری. |
| نواة مولدة | | ناووكی دروست كەر. |
| نواة حمراء | Red nucleus | ناوكی سوور، كۆمەڵە خانەیەكی دەمارییە لە بەشی سەرەوەی ناوەڕاستی مێشكدا. |
| نوار ابيض - ياسم | Privy = Privet prim | دارو دەوەنێكە لە كۆمەڵەی زەیتون، گوڵەكەی بەشێوەی هێشوویەكی بۆن خۆشە بۆ مەبەستی پەرژین ئەروێنرێت. |
| نوار مايو | May | مانگی مایس. |
| نوار صيني | Carrierea | درەختێكی دەشتەكی و رازاندنەوەیە، رەنگی لقەكانی سوورە، گوڵەكەی بچووك و سپی‌یە. |

| | | |
|---|---|---|
| نورة | Projector | پرۆجەکتۆر، دەزگایەکە بە شەو شەوق(تیشك) ئەهاوێژێت بۆ رووناك کردنەوەی دەوروبەری شوێنێك وە بینینی شتومەك. |
| نوم - مرض النوم الخطير | Sleeping Sickness | نەخۆشی نووستن. |
| نوم | Lethargy | بێ هۆشی، وەنەوز یان نوستنێکی نائاسایی. |
| نولم | Hyper Thymial | خەوتنۆکە، نوستنۆکە، بارێکە لە خەوتن دەچێت بە شێوەیەکی دەستکرد دەهێنرێتە ئاراوە. |
| نواس، بيت العنكبوت | Spider web | هێلانەی جاڵجاڵۆکە. |
| نواس - متذبذب | Oscillating | لەراوە، لەرەلەرکەر. |
| نواسة | seesaw | دیلەجو،دیلانی حەندەرهۆ. |
| نواس - بندول | Pendulum | پانتۆل، وەکوو پانتۆڵی سەعات تەنێکی هەڵواسراوە لە خاڵێکی جێگیردا دێت و دەچێت وەکوو لە سەعات دا. |
| نواس (بندول) فوكو | Foucault Pendulum | پانتۆڵی فۆکۆ، تۆپەڵێکە بە تەلێکی بارییکی درێژدا هەڵواسراوە دێت و دەچێت، بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە خڕۆکی زەوی دەخولێتەوە. |
| نولبذ | Effectors | ماسولکە لووەکان (غدد) ئەندامی وەڵامدانەوە (استجابة). |
| نواحة - نائحة | A hired Female mourner | ئەو ژنەی کە لە تەعزیەدا دەلاوێنێتەوە. |
| نواح - نياح | Loud weeping | گریان، شیوەن، گریان، بە دەنگی بەرز. |
| نواتين - نكلئين | Nuclein | نوکلین، ناوکین، توخمەکانی ناوکی خانەکە نازۆتی یان چەوری یان فۆسفۆری یان گۆگردی دەبن. |
| نواجذ - ضـرس الحلـم - ضرس العقل | Wisdom tooth = bach tooth | خڕێ، ددانی ژێری. |
| نواعم | Mollusca | گیاندارە نەرمەکان وەکو گوێچکە ماسی و شەیتانۆکە. |
| نواصة - قنديل | Night light | شەوچرا. |
| نولر الليل - شب الليل | = marvel of peru | شەوبۆ، جۆرە گولێکە. |
| نوء (طائر) | Petrel | مەلەکەش، مەلە رەشەبا، باڵندەیەکی دەریایی بچووکی باڵ درێژە. |
| نوء | Gale | بایەکە خێراییەکەی لەنێوان (٢٥-٣٥) میلە لە سەعاتێکدا. |
| نوء - نو | Gale | پشێویی دەریا، گەردلو. |
| نۆرة | Tattoo Colouring matter = smoKe of burning tallow | |
| نؤوم | | خەولر، خەفۆك، خەوخۆش، خەو قورس. |
| نو - ثيتل | Gnu = wildebeast = harte beast, bulal antelope | (نوو)، گیاندارێکە لە ئەسپ ئەچێت دوو شاخی چەماوەی هەیە لەگەڵ کلکێکی درێژ، لەشی گەورەیە سەری ئەستوورو پانە، کلکی لە کلکی ئەسپ ئەچێت، شاخەکانی ئەستوورن، گیاندارێکی شیردەرە لە کۆمەڵەی مانگا کێوی سمدارە، شێوەی تێکەڵاوە لەشێوەی مانگا کێوی و گاو ئەسپ لە خۆرهەڵات و باشووری ئەفریقاو هەندێك وڵاتی ئاسیاداو دوورگەی عەرەبی و فەلەستین، رەنگەکەی سوورێکی مەیلەو زەردە، ناوشانی بەرزە سمتی نزمە. |
| نوبة - دور | Crisis = Fit = turn = shift = occasior | نۆرە، دەور، رۆڵ. |
| نوبتجي(في الخدمة) | Onduty | نۆبەچی، ئەو کەسەی کە بە نۆرە پاسەوانی دەکات. |

| | | |
|---|---|---|
| نوبة - مرة | Once = at time | جارێك. |
| نوبة حمى | Fit | نۆرەتا. |
| نوبة - نائبة - مصيبة | Misfortune | كارەسات،كێشە. |
| نوبة البظر = حومة البظر | Clitoris Crises | ئالۆشی قیتكە، خورری قیتكە. |
| نوبة مرض | Paroxysm | نۆرەی نەخۆشی. |
| نوبليوم | Nobelium | نوبلیوم، توخمێكی كیمیاگەرییە كێشی ئەتۆمییەكەی (٢٥٤) وە ژمارەی ئەتۆمییەكــەی (١٠٢) نیشــانەكەی (No)، كانزایــەكی تیشــك دەرەوەی دەستكردە لە ئەنجامی بۆردومان كردنی توخمی كوریۆم بەناوكی كاربۆن (١٣) لـە دەزگـای سایكلۆترۆندا پـەیدا دەبێـت هـەتا ئێسـتا سـوودەكانی نەزانراون، بەناوی زانا (نۆبڵ) ـەوە ناونرا بۆ یەكەم جار لـە لایەن تیمێك لـە زانا سـویدیو ئەمـەریكیو بەریتانییـەوە لـە ئامۆژگـەی نۆبڵـی فیزیـا لـە ستۆكهۆڵم پەیدا كرا ئەویش بەوەی كە توخمی كوزیوم دراوەتە بەر ناوكی كاربۆنی (٦ك$^{١٢}$). |
| نوتي - بحار - ملاح | Nautilus = Sailor = mariner | كەشتیوان، دەریاوان، جۆرە گیاندارێكی نەرمی دەریایی ساكارە لە ناوچە گەرمەكانی زەریاكاندا ئەژی قاقلەیەكی (لەپكەیەكی) پێچاو پێچی خانـە خانەی هەیە، لە ئەختەبون (هەشت پێ) دەچێت لـە زەریای هێمندا دەژی، گۆشتەكەی ئەخورێت. |
| نوثاركتس | Notharctus | نۆساركتەس، گیاندارێكی شیردەرە لە كۆمەڵەی پێشەنگە هەر كۆنەكان. |
| نوجيلية | Naegella | نایجیلیا، رووەكێكی گوڵدارە. |
| نوح (الحمام) | Cooing of pigeon | خوێندنی باڵندە. |
| نود | Nod = nodding | سەرشۆڕكردنەوە لە ئەنجامی خەواڵوویێتی. |
| نور = ضوء | Light | رووناكی، رووناهی. |
| نور كهربي | Electric light | رووناكی كارەبایی. |
| نور الجيا - ألم عصبي | Neuralgia | نورالجیا، دەمارئێشە ئازاری دەمار لە لا تەنیشتەوە. |
| نور العين | Light of ones eyes | سۆمای چاو، رووناكی چاو. |
| نورانية - سطوع - اشراقية | Luminosit | رووناكی دانەوە، شەوق دانەوە، بریسكەدانەوە. |
| نوري - منير | Luminous | رووناكی، رووناكی دەرەوە. |
| نورستانيا | Nervous breokdowr | بێ هێزی دەمار،ماندوبوونی دەمار. |
| نورانية | Albedo | رووناكێتی، رێژەی ئەو رووناكییەی كـە لـە تەنێكـەوە رەت دەبێتـەوە بـۆ گشت ئەو رووناكییەی كە دەكەوێتە سەری. |
| نورة - جيرحي | Lime | قسڵ،كسل، ئابك، ئاژە، ئاهەك،ئۆكسیدی كالسیۆم، قسڵی زیندوو. |
| نورة | Depilatory | دەرمانی تووك لابردن، دەرمانی گەرماو. |
| نــورة - نــور - نورة زهرية | Blossom = inflorescene | شكۆفە، شكۆفەی گوڵ، ووڵ، بشكۆسك، بۆ نموونە شكۆفەی گوڵـی گێزەر وەكوو چەتر وایە. |
| نورة الزنك | Zinc bloom | گوڵە توتیا، گوڵە زینك، بریتییە لە كاربۆناتی توتیای تفت. |
| نور ساطع | Glaring light | رووناكی، پڕشنگدار. |
| نور كشاف - انوار كاشفة | Search light | رووناكی بۆ دۆزینەوە. |
| نوروز | New years day | نەورۆز، رۆژی سەری ساڵی نوێ لای كوردو فارسەكان. |

| | | |
|---|---|---|
| نورج - درلسة - مدوس | Threshing machine = disc wheel thresher | جەنجەڕ، مەکینەی گێرەکردن. |
| نور ماكول | Normacol | نۆرماکۆل، دەرمانێکە بۆ گوو پێکردن بەکاردێت بەشێوەی حەبە. |
| نورس | | خیزە خیزی سنگ. |
| نورستينيا، وهـن عصـبي، خيلع | Neuras Thenia | نۆرسـتانیا، لاوازبوونـی دەمـاریی، نەخۆشـییەکی دەروونییـە دوای خۆماندووکردن لە جووت گرتن و نەخۆشی دەماری و برسێتی و خەوزڕان و خەفەت و واهیمەوە دەبێت. |
| نورس - زمج الماء | Sea gull | قاقلی بازان،تیتلەکناچە، باڵندەیەکی ئاوییە بە قەدەر کۆترێك ئەبێت، پەڕەکەی لە سەرەوە خۆڵەمێشییە لە ژێرەوە سپییە، دەنوك و قاچی سوورن ، بەرزئەبێتەوە بە ئاسماندا لە پڕێکا خۆی ئەکاتەوە بە ئاوەکەدا بۆ ماسی گرتن. |
| نورجيسيك | Norgesic | نۆرجیسیك، دەرمانێکە بۆ چارەکردنی ئێشوئازاری شان و مل بەشێوەی حەبە. |
| نورجستيريل | Norgestrel | نۆرجیستریل، هۆرمۆنێکی پیوییە دەسکردە بۆ نەهێشتنی سکپڕی بەکاردێت. |
| نوري - غجر | Gypsy | قەرەج، بەرمیەکن لە مرۆڤ پیشەیان هەر گەشت و کۆچ کردنە لەنێوانی ئاسیاو ئەوروپاو ئەفریقیاو ئەمریکادا. |
| نورستين | Norstene | نۆرستین، دەرمانێکە دژی گیانداره سەرەتاییەکانی وەکوو ئەمیبا بەکاردێت بەشێوەی حەبە. |
| نوس - نوسان - ذبذبة | Oscillation | هاتوچۆکردن، لەرینەوە بە شۆڕی، تەکەتەك، پەل پەل، هەلورکە. |
| نوسيان | Nosean | نۆسیان، مەعدەنێکە بریتییە لە گۆگردات و سلیکاتی ئەلەمنیوم و سۆدیۆم، ڕەنگەکەی بە زۆری شینە، خۆڵەمێشی، قاوەیی،زەرد، سەوز. |
| نوش | Catch, power | گرتن. |
| نوشة - حمى تيفوئيدية | Typhoid-fever | گرانەتا . نەخۆشییەکی درمە. |
| نۆوش - قوى | Powerful | بەهێز. |
| نوشان | Rhinoceros oF Somatra | کەرکەدەنی سۆمەترا. |
| نوشادر - نشادر - امونيا | Ammonia | ئامۆنیا، گازی ئامۆنیا. |
| نوص - عير - حمار وحشي | Wild ass | کەرە کێوی. |
| نوض - عظم حرقفي | Hip bone | ئێسقانی سەرووی ران، ئێسقانی کلۆت، ئێسقانی سێ بەندە، ئێسقانی سمت، قاڵچە، کەماخ، سمت. |
| نوط | To cnarge with | سپاردن، پێوەبەستن، پیا هەڵواسین. |
| نوطة - وسام | Medal = decoration | نیشان، مەدالیا. |
| نوظة - غوتر - جوتر - تضخم الغدة الدرقية | Goitre | گۆیتەر، ئاوسانی لووی قوڕقوڕاگە. |
| نوع | Species = Kind | جۆر، چەشن، تەحر، کۆمەڵە گیانداریك یان ڕووەکێك دەشێت لەناو خۆیاندا زاوزێ بکەن. |
| نوعي | Specific = qualitative | جۆریی، چەشنی، تەحریی. |
| نوغة | Nougat | نووگێت، جۆرێکە لە حەڵوا بە هەویری فستق دەشێلرێت. |
| نوفل - ضبع ذكر | Hyena | نێرە کەمتیار. |

| | | |
|---|---|---|
| نوفة - بكف - فوانيس - حبة القلب = ضرو أسود | | دەنکی دڵ، قەزوانی رەش، رووەکێکە گوڵەکەی سپییە دەنکەکەی بە قەدەر نۆکێك ئەبێت رەش و رەقە، ملوانکەی لێ دروست دەکرێت. |
| نوفكليت | Novaculite | نۆڤاکیولایت، کەڤرێکی سلیکۆنی یە وەك بەردە هەسان بەکاردێت. |
| نوفمبر - تشرين الثاني | November | نۆڤەمبەر، تشرینی دووەم، مانگی یانزەهەمی زایینی. |
| نوفوكين | Novocaine | نۆڤۆکایین، مادەیەکی بێ هۆش کەری ناوچەییە (موضعي) واتە بۆ گشتی نییە. |
| نوفر | Nuphar = water Lily = Brandy bottle = African (or) Indian marigold | گیایەکی ئاوییە لە کۆمەڵەی لیلۆیەر، گەڵاکەی سەر ئاو ئەکەوێت گوڵەکەی زەردە، بەرەکەی لە هەرمێ ئەچێت تۆ و قەدەکەی ئەخورێت. |
| نوق - نياق - ناقة | She Camels | ووشتری مێ. |
| نوقس - برونز | Bronze | دارشتەیەکە لە مس و تەنەکەو توتیا. |
| نوكلين | Nuclein | نوکلین، پرۆتینێکە لە پێکهاتی ناوکدا هەیە، |
| نول - منول - منسج | Loom = hand Loom | تەون، تەڤن، بەوەش، نەوەرد، دەزگای جۆڵایی، تەختەیان ئامرازی جۆڵایی کە لە سەری ئەچنرێت وە چنراوەکەی تێوە ئەپێچرێت. |
| نول | Giving = granting | دان، تەسلیم کردن. |
| نولان | Nolana = chilianbell-Flower | رووەکێکە گوڵەکەی لە زەنگۆڵە ئەچێت، بە رەنگی شین و زەرد یان بنەوشەیی. |
| نولفاديكس | Nolvadex | نۆلڤادێکس، دەرمانێکە دژی وەرەم بەکاردێت، بەشێوەی حەبە. |
| نوم | Sleeping = slumber | نوستن، خەوتن، نڤستن، خەون، خەو. |
| نوم مغناطيسي | Hypnotism | نوستنی موگناتیسی. |
| نوم مرضي- نوم مضطرب | Parahypnosis | نوشتنێکی بێئارامی. |
| نوم عميق | Carus | خەوی قورس. |
| نوم خفيف | | خەوی سووك، سەرخەو. |
| نوم صاح - المشي اثناء النوم - ترويض - سرنمة | Somnambulism | بەدەم خەوەوە رۆیشتن. |
| نوموطرام - مخطط بياني | Nomogram | هێڵکاریی، روونکردنەوە. |
| نومان - خشخاش أبو النوم | Poppy | خاشخاش، کۆکەنار، رووەکی بەنگ، رووەکی تلیاك. |
| نومان - حشيشة الفتق | Rupture wrot Turks herb | گیا قۆڕی، گیایەکی دەشتەکی پزیشکییە گەڵاکەی وردە، گوڵەکەی بچووکە جاران بۆ چارەکردنی قۆڕی بەکار ئەهێنرا. |
| نومي - ليمون حامض | Lime, Lemon | لیمۆی ترش. |
| نومي حلو - ليمون حلو | Sweet Lime | لیمۆی شیرین. |
| نومي هندي - ليمون الجنة | Grape Fruit | لیمۆی هیندی، سندی، لیمۆی ترش گەورە. |
| نون | Fish | ماسی. |
| نون | Sea snake | مارماسی،مارماهی. |
| نونة - نقرة الذقن | Dimple in the chin | چاڵی چەناگە. |
| نونان | nonane | گازێکی هایدرۆکاربۆنییە لە (٩) ئەتۆم کاربۆن و (٢٠) ئەتۆم هایدرۆجین پێك هاتووە، شلەیەکی بێرەنگە بۆ پاکژکردنەوە بەکاردێت. |
| نوويات | Nucleons | نیوکلیونس، ئەو پرۆتۆن و نیوترۆنەی کەناوکی هەر ئەتۆمێکی لێ پێك دێت. |

| | | |
|---|---|---|
| نووي | Nuclear | ناوكی، هەرشتێك پەیوەندی بە ناوكەوە هەبێت. |
| نووين | Nuclein | نیوكلین، مادەیەكە لە ناوكی خانەكان دەردەهێنرێت. |
| نوويات | Nucleonics | نیوكلیونیكس، لقێكـە لـە زانسـتی فیزیـا باسـی ناوكۆكـەكان یـان هـەموو دیاردەكانی ناوكی ئەتۆم دەكات. |
| نووي حراري | Thermonuclear | ناوكی گەرمی، هەرشتێك پەیوەندیی بە ناوكی‌و گەرمی‌یەوە هەبێت. |
| نونيليون | Nonillion | نۆنیلیۆن، ژمارەیەكە لـە ئەمـەریكا دەكاتـە ژمـارە(١)و لای راسـتی‌وە(٣٠) سفر هەبێت بەڵام لە بەریتانیاو ئەڵمانیا دەكاتە (١)و لای راستی‌یەوە (٥٤) سفر هەبێت. |
| نوى | Being Far (or) distant | دووری، شوێنێك دووربێت. |
| نويسة - ولاعة السجاير | Cigarette Lighter | چەخماخی ئاگركردنەوە، قوتیلە، چرای بچووك. |
| نوية | Nucleolus = nucleon | نیو كلیۆن: یەكێكـە لـەو بەشـە بنچینەیی‌یانـەی كـە نـاوكی ئـەتۆم پێـك دەهێنن وەكوو: پرۆتۆن یان نیوترۆن. |
| نويدة | Nucleide | نوكلید، ئەتۆمێكـە پێكهاتێكی نـاوكی تایبـەتی هەیـە، هـەروەها ژمـارەی پرۆتۆن‌و نیترۆن ووزەی تایبەتی خۆی هەیە. |
| نويي | Nucleolar | ناوكۆكەیی، هەرشتێك پەیوەندی بە ناوكۆكەوە هەبێت. |
| نويع | Supspecies | جۆرۆكە. |
| نيء | Green unripe = raw = uncooked | كاڵ، كرچ، خرچ، نەكوڵاو، نەگەیوو، پێ نەگەیشتوو. |
| نياط - نياط القلب | Heartstring | بەنگی دڵ، ژێی دڵ. ریشەی دڵ. دەمارێكی ئەستوورە نووساوە بە دڵـەوە ئەگەر بپچرێت ئەو كەسە ئەمرێت. |
| نيابة - وكالة | Representation | جێگری، جێگریی، فرمانی جێگری. |
| نيابي - بالوكالة | Representative | هەرشتێك پەیوەندی بە جێگیری‌یەوە هەبێت. |
| نيـابي - مختـص بالمجـالس النيابية | Parliamentary | هەرشتێك پەیوەندی بە ئەنجوومەنی جێگیری‌یەوە هەبێت. |
| نياح - نياح شوكي الجناح - طير التمساح - تورم | Crocodile bird | باڵندەی تیمساح، جۆرە باڵندەیەكە زەرووی سەر لەش وە نادەمی تیمساح ئەخوات. |
| نياسين | Niacin = nicotinicacid | نیاسین، ترشی نیكۆتینیك. |
| نياندرتالي | Neandertthal | نیاندیر ثاڵ، پەیوەندی بە دۆڵی (شیوی) نیاندە ر ثاڵەوە هەیە لەنزیك ناوچەی دوسیلدورف لە ئەڵمانیا پاشماوەی پەیكەری مرۆڤی كۆنی تیایدا دۆزراوەتەوە. |
| نيبم - نابالم | Napalm | ناپاڵم، مادەیەكی تەقەمەنی‌یە بۆ دروست كردنی بۆمبای سوتێنەر بەكاردێت. |
| نيبتونيوم | Neptunium | نیپتۆنیۆم، توخمێكی تیشكدەرەوەیە ژمارەی گەردیلەیی‌یەكەی (٩٣) یەو كێشـی گەردیلەیەكـەی (٢٣٧) و نیشـانەكەی (Np) ، (١١) هاوتـای هەیـە، هاوهێزی (٣،٤،٥،٦) هەیە، جاران لە ئەنجامی بۆردومان كردنی یۆرانیۆم بە دیوترۆنی خێرا دروست دەبوو، لە ئامرازی دروست كردنی ئـامرازی دۆزینەوەی نیوترۆندا بەكاردێت. |
| نية | Purpose = desigh | نیاز، مەبەست. |
| نيتروجين | Nitrogen | نایترۆجین |
| نيتريد البورون | Boron nitride = BN | نیتریدی بۆرۆن، بەشێوەی تۆزێڵی شەش سووچ یان تۆزی سپی هەیـە، لە دروست كردنی تەنووری رەت كەرەوە (فرن عاكس) و بۆ ئەوترانسیستەرو ریكتیفایەرو ریشاڵی زۆر قایمدا بەكاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| نيتون | Niton = radon | نیتۆن، رادۆن، توخمێکی کیمیایی تیشکدەرەوەیە بە شێوەی گازێکی سستی بێ رەنگ ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٨٦)و کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (٢٢٢) (١٨) هاوتای هەیە لە ئاودا دەتوێتەوە لە ئەنجامی تیشك دانەوەی رادیۆمەوە پەیدا دەبێت بۆ مەبەستی پزیشکی و وێنەگرتنی رادیۆیی و ناسینەوەی کیمیایی بەکاردێت. |
| نيتون | | درەختێکی بۆگەنە. |
| نيترومتر - ازوتومتر | Nitrometer | نیترومەتر، دەزگایەکە بۆ پێوانی قەبارەی گازی نایترۆجین. |
| نيترون | Nitron | نیترۆن، مادەیەکی ئەندامی‌یە بەشێوەی بلووری زەرد هەیە، لە ناسینەوەی رەنگی نیتراتدا بەکاردێت. |
| نيتريت الباريوم | Barium nitrike = Ba $(No_2)_3$ | نیتریتی باریۆم، بەشێوەی تۆزێکی سپی مەیلەو زەرد هەیە وەکوو پەین بەکاردێت، نایترۆجین دەدات بە خاکەکە. |
| نيتريت الأميل | Amyl nitrite | نیتریتی ئەمیل، شلەیەکی زەردە، بۆنی میوەی لێ دێت، تامەکەی تفتە، لە دروست کردنی دەرمان و عەتردا بەکاردێت. |
| نيتروليم | Nitrolim | نیترولیم، ئەو مادەیەیە کە لە ئەنجامی تێپەرکردنی گازی نایترۆجین بەسەر ئاوێتەی کاربیدی کالیسیۆمی گەرمدا پەیدا دەبێت ، بریتی‌یە لە تێکەڵاوی سیانامیدی کالسیۆم و گرافیت. |
| نيجوس | Negus | نیجوس، جۆرێکە لە مەی لە شەراب و ئاوی گەرم و کەمێك شەکر و ئاوی لیمۆ ئامادە دەکرێت. |
| نيجاترون | Negatron | نیگاترۆن، ناوێکی ترە بۆ ئەلیکترۆن. |
| نيدمان - نديان - ورد الشمس | Lust wort = Sundew | گیایەکە لە زەلکاودا ئەڕوێت، گەڵاکەی خڕە مادەیەکی لینج دەرئەدات مێرووی پێ ئەگرێت و ئەی مژێت و هەرسی ئەکات، بەرەکەی هێلکەیی‌یە. |
| نيذة | | سەمەنی. |
| نير - مضيء - منير | Luminous | رووناکی دەرەوە،شەوقدەرەوە،تیشکدار. |
| نير - ناف | Yoke | ١) کەڵەمە، نیڵە، جوق، تەوق، بریتی‌یە لە چوار دانە داری خوار کە هەر دوانیان لە سەرێکی نیڵەدا ئەخرێتە ملی گاجووتەوە لەکاتی جووت پێ کردندا. ٢)هەروەها تەختەیەکی پانە بریتی‌یە لە ئامرازی چنین. |
| نيريدازول | Niridazole | نیریدازۆل، جۆرێکە لە دەرمانی کرم. |
| نير الغارب | Withers yoke | |
| نير اعظم - الشمس | The lamp of Phoebus | روجیار، خۆر، چرای ئەپۆڵۆ، چرای خواوەندی شیعر و مۆسیقا و جوانی لای گریکی‌یەکان. |
| نيران - الشمس والقمر | The two great luminaries | دوو تەنە درەوشاوەکان: رۆژ و مانگ. |
| نيريتي | Ineritic, neritic | نێریتیك، ئەو تەنکاوەی کە دەکەوێتە سەر شۆسەی کیشوەرەکان. |
| نيروز | | راجع (نوروز). |
| نيروسون | Nerison | نێریسۆن، دەرمانێکە لە چارەکردنی نەخۆشی پێستدا بەکاردێت. |
| نيرولي - عطر القداحي | Neroli | عەتری گوڵی پرتەقاڵ. |
| نيرس | Nereis | نێریس، کرمێکی دەریایی ئەلقەداری مەیلەو سەوزە. |
| نيرة - شجرة النير - قربينوس | Horn beam = Car pinus | کارپینوس، درەختێکە لە کۆمەڵەی بەڕوو تەختەکەی رەقە. |

| | | |
|---|---|---|
| نيرايد | Neried | نيرايد، پاشكۆی هەسارەی نیپتۆنە، دووری لە هەسارەکەیەوە ٢٧٥٠ x ١٠[٣] میلە، تیرەکەی (١٩٠) میلە زانا کوپیر لە ساڵی ١٩٤٩دا دۆزیویەتییەوە. |
| نير نعيم | Acrux | درەوشاوەترین ئەستێرە لە خاچی باکووری ئاسماندا. |
| نيزك | Meteor = meteorite | بەردە ئاسمانی بەردە ئەستێرە، تەنێکی ئاسمانییە لە بۆشایی دەرەوە دێنە بەرگی کەشی دەوروپشتی زەوییەوەو دەسوتێت و دەکەوێتە سەر زەوی بەشێوەی تۆپەڵی رەقی گەورە، کە لە شێوەو قەبارەدا جیاوازە. |
| نيزك حديدي | Irons meteorites | نێزەی ئاسن، لە ٩٩٪ دارشتەی نیکل-ئاسنی تیادایە لەوەی کە لە ناخی زەویدا هەیە، لەم دارشتەیە ٥-٢٠٪ نیکلە. |
| نيزك دقيق | Micro meteorite | بەردە ئاسمانی ورد، تیر شەهاوی ورد. |
| نيزب | Gazelle)(male) | نێرە ئاسك. |
| نيزك | Bolide = Meteors = Meteorite | بەردە ئەستێرە، تیرشهاوی گەورە، ئەستێرەی کشاوی گەورە، نێزە، بەردە ئەستێرە بریتییە لە ئەستێرەیەکی کشاوی گەورە، لە بۆشایی دەرەوە دێتە بەرگی کەشی زەوی و دەسووتێت، هەندێکی گڕی گرتووە پاشماوەکەشی بەشێوەی بەردێکی کانزایی گەورە ئەکەوێتە سەر زەوی جارێکیان کێشی یەکێك لەو نێزانە (٦٦) تەن بووە. |
| نيسان | April | گوڵان، شەستەباران، هەرمێ پشکوان، مانگی چوارەمی زایینییە ئەکاتە ٣٠ رۆژ. |
| نيستاتين | Nystatin | نیستاتین، دەرمانێکە دژی کەڕوو (میکرۆب) بەکاردێت لە چارەکردنی نەخۆشییەکانی گوێچکەو لووت و قوڕگدا بەکاردێت. |
| نيشان | Tuft | ئەڵقەیەك لە تووك. |
| نيص - شيهم - قنقع - دلدل | Porcupine = hystrix | سیخوڕ،سووچەر، گیاندارێکی قرتێنەری مێروولە خۆرە لە ژێرگ ئەچێت، تووکەکەی ئەستوورە لە قەڵەم یان لە دڕك ئەچێت، ئەگەر گیاندارێکی تر پەلاماری بدات دڕکەکانی تێ دەچەقێنێت و ئازاری پێ دەگەیەنێت. |
| نيفرون | Nephron | نیفرون، یەکەی پێکهاتنی گورچیلە. |
| نيفيلين | Nepheline | نیفیلاین، کەرەسەیەکی خاوی بەهاداری مەعدەنییە، یەکێکە لە سەرچاوەکانی ئامادەکردنی کانزای ئەلەمنیۆم. |
| نيفيلو مترية | Nephelometry | نیفیلۆمەتری، پێوانی پەرت بوونەوە، رێگەیەکی رووناکییانەیە لە شیکردنەوەی کیمیایدا بەکاردێت، کارەکەی لەسەر بڕی ئەو رووناکییە وەستاوە کە لە لایەن مادەی گیرساوەوە (هەڵواسراوەوە) پەرت دەبێتەوە. |
| نيك - جماع - وطء | Copulation = Coltion = sexual intercourse | گان کردن، جووت گرتن. |
| نيكوتين - تبخين | Nicotine | نیکۆتین، ئاوێتەیەکی پەرشەوە بووە لە کاربۆن و نایترۆجین و هایدرۆجین پێك هاتووە، لە روەکی تووتن دا هەیە، شلەیەکی دیمەن چەوری بێ رەنگە، ئەگەر بەر هەوا بکەوێت قاوەیی ئەبێت، ژەهرە کار ئەکاتە سەر مێشك و بۆڕی خوێن، دەرمانی لێ دروست دەکرێت و دژی مێش و مەگەزی رووەك بەکار دێت. |
| نيكوتياني | Nicotiana | نیکۆتیانا، جۆرێکە لە تووتن. |
| نيكۆتيني | Nicotinic | نیکۆتینی، هەرشتێك پەیوەندی بە نیکۆتینەوە هەبێت. |
| نيكوليت - نيكلين | Niccolite = nickeline = Kup Fernickel | نیکۆلایت، نیکلاین، مەعدەنێکە بریتییە لە زەرنیقیدی نیکل، رەنگەکەی سووری مسی کاڵ، هەندێك جار پەڵەی خۆڵەمێشی تیادا ئەبێت، کەرەسەیەکی خاوی نیکلە. |

| | | |
|---|---|---|
| نيكل | Nickel | نيكـل، توخمێكـى كيميايىيـه، كێشـى ئەتۆمىيەكـەى ٧و٥٨)و ژمـارەى ئەتۆمىيەكەى (٢٨) بريتىيە لە ميتالێكى سپى زيوى، ناوەكەى لە وشەى (نايكل) واتە ((شەيتان) وەرگيراوە، بۆ رووكەش كردنو دروست كردنـى دارشته بەكاردێت نيشانەكەى (Ni) دارشتەى زيويى ئەڵەمانى ٢٠٪ نيكل، ٥٥٪ مس ٢٥٪ زينك(توتيا)، هەندێك پارە لە دارشتەيەك دروست دەكرێن كە لە ٧٥٪ مس و لە ٢٥٪ نيكلە، هەروەها هەندێك ئامرازى چێشتخانە لە پـۆڵاى نيكـلو هـەندێك پارچـەى ئوتومبێـلو گاليسـكەى شـەمەندەفەرئەو پۆڵايـەى كـە ژەنـگ هـەڵ ناهێنێت نايابەو بەرهەڵستى داخـوران و گـەرى دەكاتو لە كارگەى هەڵگرتنو پاراستنى خۆراكدا بەكاردێت. |
| نيكلي | Nicke lic | نيكلى، هەرشتێك پەيوەندى بە نيكلەوە هەبێت. |
| نيل - نوال. | Gain - win | وەرگرتن، دەست كەوتن، گەيشتن بە مەرام. |
| نيل - نيلة | Indigo - Turnosole - (Vatblue-1) - Dyers indigo | چوويت، ليلەنگ، خوم، هەش، خومى شين، رەنگێكى شينە لە ترشاندنى رووەكى چوويت دەست ئەكەوێت، بۆ رەنگ كردن بەكاردێت. |
| | Indigo plant - Indian-plant | رووەكى چويت، رووەكێكە قەدێكى رەقى هەيە لقى باريكى لێ ئەبێتەوە گەڵاكەى وردە، ئەترشێنرێت، واتە خۆشە ئەكرێت رەنگى چويتى لێ دەردەهێنرێت، گوڵەكەى وردە رەنگى پەمبەيى يان سوورە. |
| نيلية | Neillia | نيليا، دەوەنێكە لە كۆمەڵەى گوڵەباخ بۆ رازاندنەوەى باخچەكان. |
| نيلي ١ | Indigo | چويتى، جۆرە رەنگێكە. |
| نيلـــة بريـــة - وسمة - عظلم. | Wild indigo - false indigo - horsefly | چويتە كێويلە، گەنمەچويت، رووەكێكە تونكـڵو رەنگەكـەى بـۆ دەرمـانى رشانەوەو رەوان كەر بەكاردێت، گەڵاكەى رەنگى رەشى پێ ئەكرێت، وسمە. |
| نيلين | Indigotin - Indigoblue | شينى چويتى، مادەيەكى سپىيە كە بەر هەوا دەكەوێت شين دەبێت ئەو مادە سەرەكىيەيە كە لە چويتدا هەيە. |
| نيلج - دودة - سناج | Soot - lamp black | رەشى مەنجەڵ، خاكە خەڵوز، دورينج، دورژينك، قورم، گوژمنك. |
| نيلج - ليلك | Pipe tree, lilac | لەيلاق. |
| نيلت، ظبي | Antelope | جۆرێكە لە مانگا كێوى. |
| نيلوفـر - نينوفـر - بشـــــنين - نيلوفر العروس | White Water-lily - nymphaea - nenuphar - water lily | ليلۆپەر، هەنگ كوژە، روتاج، شلێرى ئاوى،زەمەقى ئاوى، كـارى، جـۆرە رووەكێكى ئاوى جوانـە گوڵەكـەى بـەيانيان ئەپشكوێتو ئێـواران سـيس ئەبێت، رەنگى گوڵەكەى سپى يان شين يان زەرد وە يان سوورە، هەندێكى قەدو تۆوەكەى ئەكرێت بە ئارد، هەندێكى بۆ رازاندنـەوە ئەروێنرێت جارى وا هەيە تيرەى گەڵاكەى ئەگاتە (٢) مەتر. |
| نيم | Ripple marks | شوێنە شەپۆل، شوێنى شەپۆلى ئاو كەلەسەر لم دەردەكەوێت. |
| نيماكون | Nemagon | نيماگۆن، دەرمانێكە بۆ چارەكردنى نەخۆشى رووەكى |
| نيم | | درەختێكە درِكێكى نەرمى هەيە، گەڵاكەى وردە، دەنكەكەى لە نۆك ئەچێت لە پێشا ترشەو لە دواييدا رەشو شيرين ئەبێتو ئەخورێت. |
| نيمبرشت | Soft boiled(eggs) underdone | برشت،دەڵەمە، وەكوو هێلكەى دەڵەمە، نيوە كوڵاو. |
| نينون | Ninon | نينۆن، قوماشێكى تەنكى رۆشنە. |
| نيوبرين | Neoprene | نيوپرين، جۆرێكە لە لاستيكى دەستكرد لە ئەسيتيلين دروست ئەكرێت. |
| نيو بركين | Nuper Caine | نيو پيركين، نيوپێركارين، دەرمانێكە بۆ بێ هۆش كردنى ناوچەيەك لە لەشدا لە پرۆكايين هەرزانترە لە بنەرەتدا لە بێهۆشكردنىمەغزى دركاوييدا بەكاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| نيوبيوم | | راجع ( نايوبيوم ). |
| نيو بلينا | Neopilina | نيوپيلينا، گياندارێكی نەرمی لەپكەدارە بە بەردەوە ئەنوسێت سالی ١٩٥٦ لە زەریایی هێمندا دۆزراوەتەوە. |
| نيوت = سمندل الماء | Newt - tritonium | نیوت، قورناویلكەی ئاویی، جۆرە گیاندارێكی بچووكی جوانە تەرووشكی‌یە، پشتی رەشە ژێر سكی زەردە، لە زستاندا لەژێر قوڕی زەوی‌دا خۆی مت ئەكات، كلكی هەیە لە بۆق ئەچێت. |
| نيوترينو | Neutrino | نیوترینو، وردیلەیەكی بێ بارگەیە بارستەكەی ئەوەندە بچووكە پشت گوێ دەخرێت چونكە دەكاتە بەشێك لەسەد بەشی بارستەی ئەلیكترۆن. |
| نيوتن | Newton | ١) ناوی زانایەكی بەناوبانگە،٢) پێوەرێكە بۆ كێش ئەكاتە سەد هەزار داین، یان بریتی‌یە لە هێزی كێش كردنی زەوی بۆ تەنێك كە بارستایی‌یەكەی ٩٨/١ كیلۆگرام بێت.، ٣) یەكەی هێز لە رژێمی مەتر كیلۆگرام-چركەدا نیوتینی (newtonian) هەرشتێك پەیوەندی بە نیوتنەوە هەبێت. |
| نيوترون | Neutron | نیوترون، وردیلەیەكە(تەنۆكەیەكە) لە ناوكی ئەتۆمی هەموو توخمێكی كیمیایدا هەیە جگە لە هایدرۆجینی ئاسایی، كارەبایی لەسەر نی‌یە، كێشەكەی (بارستەكەی) وەكوو هی پرۆتۆن وایە، نیوترۆن هاوێژراوێكە لە لەت كردنی ناوكیدا بەكاردێت. |
| نيوتريتو | Neutreto | نیوترینۆ، ناوێكە هەندێك جار بۆ (میزون)ی بێ رەنگ بەكار دەهێنرێت. |
| نيوكليد | Nuclide | نیوكلید، جۆرێكی تایبەتی‌یە لە ئەتۆم، ناوكەكەی لە كۆمەڵەی دیاریكراو لە پرۆتۆن‌و نیترۆن پێكهاتووە. |
| نيون | Neon | نیۆن، توخمێكی كیمیایی‌یە كێشی ئەتۆمی‌یەكەی (٢٠)و ژمارەی ئەتۆمی‌یەكەی (١٠) بەشێوەی گازێكی بێ بۆنی سستە، یەكێكە لە گازە دەگمەنەكان، ناوەكەی لە وشەی (نیۆس) واتە تازە وەرگیراوە، نیشانەكەی (Ne) بە دەگمەن لە هەوادا هەیە ، ئەكرێتە گلۆپی نیونەوە، ئەگەر كارەبای پیادا بڕوات شەوقێكی سوور ئەدات. |
| نيودكسون | Neodexon | نیودیكسۆن، جۆرێكە لە قەترە بۆ چاوو گوێچكە بەكاردێت. |
| نيومايسين | Neomycin | نیومایسین، دەرمانێكە دژی میكرۆب بەكاردێت بەشێوەی دەرزی‌و حەب هەیە. |
| نيوديميوم | Neodymium | (نیودایمیۆم)، توخمێكی كیمیایی‌یە كێشی ئەتۆمی (١٤٤)و ژمارەی ئەتۆمی‌یەكەی (٦٠)، میتالێكی زەردی كاڵە، ناوەكەی لە وشەی (نیوس- دای دیموس) واتە برای سەوز، وەرگیراوە نیشانەكەی (Nd)، یەكێكە لە توخمە گڵی‌یە دەگمەنەكان هاوهێزی یەكەی (٣) یان (٤)و(٧) هاوتای هەیە، رەنگەكەی مەیلەو زەردە، هایدرۆجین لە ناو دەردەدات‌و لە ترشە روونەكاندا دەتوێتەوە لە مەیانی ئەلیكترۆنیك‌و دارشتەو شووشەی رەنگاو رەنگدا بە تایبەتی زەرەبینی تەلیسكۆپ‌و تیشكی لیزەردا بەكاردێت. |
| نيورولوجي | Neurology | نیورۆلۆجی: زانیاری دەمار، دەمارزانی. |
| نيورالجيا | Neuralgia | نیورالجیا، ئێشو ئازاری دەمار. |
| نيولوجيا | Neology | نیولۆجی، بەكارهێنانی وشەی نوێ. |
| نيورون | Neuron | نیورۆن، یەكەی پێكهاتنی شانەی دەماریی. |
| نيوليثي، نيوزوي - عصر حجري حديث | Neolithic | سەدەی بەردینی نوێ. |

| | | |
|---|---|---|
| نیوجین | Neogene | نیۆجین، بەشێکە لە وەختی جیۆلۆجی بریتی‌یە لە دووەم سەردەمی چاخی سێ‌هەم لە دێرینی ژیانی نوێ. |
| نیوجینون | Neogynon | نیۆجینۆن، دەرمانێکە بۆ نەهێشتنی سك پڕی بەکاردێت. |
| نیوساینفرین | Neo-Synephrine | نیۆساینفرین، جۆرێکە لە قەترەی لووت. |
| نیومیلادینین | Neo meladinine | نیۆمیلادینین، دەرمانێکە بۆ چارەکردنی نەخۆشی پێست وەکوو لابردنی پەڵەی سپی سەر پێست بەشێوەی حەب هەیە. |
| نیوروکاردین | Neuro Cardine | نیۆرۆکاردین، دەرمانێکی هێمن کەرەوەیە بۆ چارەکردنی کرژ بوونی بۆرییەکانی خوێنی دڵ بەکاردێت. |
| نیوراستینیا - نهك عصبي | Nervous-Breakdown | شەکەت بوونی دەماریی. |
| نیوکلیاز | Nuclease | نیوکلیاز، ئەنزیمێکە لە خانەکانی پەنکریاسدا هەیە. |
| نیوکاسل (داء) | Newcastle-disease | نەخۆشی نیوکاسڵ، یەکێکە لە نەخۆشی‌یەکانی مریشك. |
| نیوهامبشیر - دجاج هامبشیر | New-Hampshire | نیوهامپشایەر، جۆرێکە لە مریشکی ئەمەریکی لە زستاندا هێلکە زۆر دەکات. |
| نیوسیني | Neocene | نیوسینی، سەردەمێکی جیۆلۆجی‌یە. |
| نیومایسین | Neomycin | نیومایسین، دەرمانێکە دژی میکرۆب بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| هائمات - عوالق | PlanK ton | (پلانکتۆن) سەر ئاو کەوتووەکان، ئەو گیاندارو رووەکە وردانەی کە سەر ئاو ئەکەون. |
| هائف - هیفان - شدید العطش | Parched = Very Thirsty | زۆر تینوو. |
| هائم - متحیر | Bewildered = distracted | ئاوارە |
| هائل - مهول، هائل الحجم | Terrible = Frightful | ترسناك، گەورە ، زۆر گەورە ، مەزن. |
| هائج - مضطرب | Excited = disturbed | خرۆشاو، وورووژاو، شپرزە. |
| هائب - هیاب | Timid = timorous | ترساو. |
| هابط - نازل | Descendant | داکەوتوو. |
| هابوش | Piumed-midges | مێشوولەی وورد. |
| هاتف - تلفون | Telephone | تەلەفۆن، دوورژنەفت. |
| هاتف اوتوماتیکي | Automatic Telephon | تەلەفۆنی ئۆتۆماتیکی. |
| هاتف لاسلکي | Wireless-telephone | تەلەفۆنی بێتەل. |
| هاتف - صائح | Shouter | هاوارکەر. |
| هاجة | She frog | بۆقی مێ. |
| هاجع - خامد | Dormant | نوستوو، خامۆش، وەکوو گڕکان. |
| هاجرة - دائرة - خطوط الطول - منتصف النهار | Meridian | (۱) بازنەی هێڵەکانی درێژی ئەو هێڵە سەرەکییەی کە پلەکانی درێژی لەسەر ئەپێورێت. (۲)نیوەڕۆ -ناوەراستی رۆژ. |
| هاجرة - خط الزوال | Meridian | نیوەڕۆ، بازنەی هێڵی لاچوون، پاش نیوەڕۆ تینی گەرما. |
| هاجس - خاطر، فکرة | Idea = Thought | خولیا، ئەندێشە، ئەو شتە کە بە بیرا دێت. |
| هادم | Demolisher | روخێنەر، تێکدەر. |
| هاذ | Raving = delirious | وڕێنەکەر. |
| هاریکین | Hurricane | زریان، بارانێك هەورە بروسکەی لەگەڵدابێت وەکوو ئەوەی کە لە دەریای کاریبیدا روودەدات. |
| هارموتوم | Harmo tome, Harmotom | (هارمۆتۆم)،مەعدەنێکە بریتییە لە سلیکاتی باریۆم و ئەلەمنیۆمی ئاوی بە رەنگی : سپی، زەرد،مێخەکی، قاوەیی مەیلەو سوور هەیە. |
| هاراکیري | Hara = Kiri | (هاراکیری) خۆکوشتن بەرێگەی یابانی، سك هەڵدرین بە خەنجەر. |
| هارون | Cat | پشیلە |
| هار | Harrier | جۆرێکە لە هەڵۆ. |
| هارب - هربان | Runaway = escape | راکردوو، هەڵهاتن. |
| هارمونیکا | Harmonica | (هارمونیك)، ئامرازێکی مۆسیقایە. |
| هازي - مستهزي | Scorner = scoffer | گاڵتەپێکەر. |
| هازجة - شوالة | Warbler = sedge war bler | واربلەر، جۆرە باڵندەیەکی بچووکی دەنگ خۆشە. |
| هازجة القصب - بودخنة - دخناء - رخنان | Reed warbler | واربلەری ناو قامیشەڵآن. |
| هازجة اوروبا | Chiff chaff | واربلەری ئەورووپی. |
| هاطل | Praeci pita tio | جۆرێکە لە هەور. |

| | | |
|---|---|---|
| هاضم، هاضوم | Digestive | هەرسکەر، ئەزمکەر. |
| هافایە - شجرە المطاط | Hevea | هیڤیا، درەختی لاستیك. |
| هافنیوم | Hafnium | هافنیوم- توخمێکی کیمیاییە کێشی ئەتۆمییەکەی (١٧٨ر٦)و ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٧٢) کانزایە کە ماناکەی لە وشەی (هوفنیا) واتە شاری (کۆبنهاگن) وەرگیراوە، نیشانەکەی (HF). |
| هافت - خافت | Faint | کز، لاواز. |
| هاقل | Alactaga | ١) رسق، نێرە مشك، جۆرە مشکێکی گەورەیە.<br>٢) گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە کۆمەڵەی گۆڕ هەڵکەنە لە مشك ئەچێت، کلکی درێژە، سەری بچووکە چاوی گەورەیە ، لاقی درێژە، دەستی کورتە، رەنگەکەی قاوەیی مەیلەو زەردە لەژێر زەویداقومـوش لێ ئەدات. |
| هالة | Corono = Halo | خەرمانە ، ئەڵقەیەکە لە رووناکییەکی کز دیاردەیەکی رووناکییە هەندێك جار لە دەوری خـۆر یـان مـانگدا دەبیـنرێت، لـە ئـەنجامی شـکانەوەی رووناکییەکانیانەوە پەیدا دەبێت بەهۆی وردە بەفری ناوکەشەوە. |
| هالة | Halo | هالۆ، خەرمانە، ناوی ئەستێرەیەکە بە عەرەبی. |
| هـالوك - جـزر البقـر، هرقلیة | Downy-cowparsnip | هەرقلی، ڕووەکێکی گوڵدارە. |
| هالك - فان | Perishing | لەناوچوو. |
| هال | Cardamom | حێل، یەکێکە لە بەهاراتە زۆر کۆنەکان، جاران لە میسردا بۆنی خۆشی لێ ئامادە دەکرا،، بەڵام لە هەزارەها ساڵ لەمەو بەرەوە بۆ چارەکردنی پشێوی کۆئەندامی هەرس بەکار ئەهێنرا، بەتایبەتی گرفت و گـازو سـووتانەوەی گـەدەو دڵ تێکەڵهاتن و بۆنـی نـاودەم، مـیز رەوان دەکـات، هـەروەها بـۆ چارەکردنی بەرهەنگ (ربو)و بەردی گورچیلەو بـۆ چـالاك کردنـی لـەش و توانای رەگەزی بەکاردێت. |
| هال - هیل -هیلبوا - حب الهـال - قاقلـة - شوشمة = شوشمیر - خیربوا - حبهان | Cardamom = Cardamon (Amomum) | هێل، حێل، قاخلی، کاژیلە، رووەکێکە لە کۆمەڵـەی زەنجەفیل، قەدی ژێـر زەوی هەیە، وە لە ناوچە گەرمەکان ئەروێت، رۆنێکی بۆنخۆش لە تۆوەکەی دەردەهێنرێت، بـۆ مەبەسـتی بۆنخۆشـی کـردن و پزیشـکی بـۆ هـەرس و وورپاکردنـەوەی دڵ وە بـەهێزکردنی ئـارەزووی رەگـەزی و دژی کۆلنـج و بەشێوەی بەهارات بەکاردێت. |
| هالة - هالة الشمس | Halo = sun-halo | خەرمانە، ئاخلە، جێژ، جوخینە، خەرمانەی خۆر پشتێنەیەکە لە گاز وەکوو رووناکییەکی سپی دەوری خۆر دەدات. |
| هالوجین = هالوجینات | Halogen | (هالۆجین) خوێ پەیداکەر، کۆمەڵە توخمێکی ناکانزان ن وەکوو: فلۆرین و کلۆرین و برۆمین و ئایۆدین. |
| هالوجینات بینیة | Interhalogens | هالۆجینە نێوانی یەکان، کۆمەڵە ئاوێتەیەکی دوو توخمی لە قەن وەکـوو کلۆریدی برۆم. |
| هالوك،طرثوث - کثوث - ججعفیل | Broom-rape = Orobanche = dodder | گورگە، گیاگورگە، رووەکێکی مشەخۆرە مادەی کلورفویلی نییە، قەدەکەی ئەسـتوورە ، رەنگەکـەی بـۆرو مەیلـەو شـین ئـەدات ، ئـەدات لـە تەماتـەو باینجـان و تووتـن و زیانیـان پـێ ئەگەیـەنێت، گوڵەکـەی شـینە لەشـێوەی رەحەتی دایە. |
| هاله القمر - دارة القمر | ivnarhalo | خەرمانەی مانگ، مەهتاب. |

| | | |
|---|---|---|
| هالة الثدي -لعوة | Areola of mammary gland | خەرمانەی مەمك، پەڵەیەکی رەش مەیلەو قاوەیی‌یە لە دەورو پشتی گۆی مەمکدا. |
| هاليدات | Halides | هالیدەکان= خوێیەکانی فلۆرایدو کلۆرایدو ، برۆمایدو، ئایۆداید. |
| هاليد الألكيل | Alkyl halide | هالیدی ئەلکیل، ئاوێتەیەکی کیمیایی‌یە. |
| هاليزة،لعل - جرس فضي | Silver bell tree = snow drop tree = Hale sia | زەنگوڵە زیبوی،دارو دەوەنێکە گوڵەکەی سپی، زەنگوڵەیی‌یەو بەرەکەی باڵدارە. |
| هاليت | RocK salt | راجع (ملح الكعام الصخري). |
| هامة (هوام) | Vermin = littleanimals | گیانەوەی بچوك، جرو جانەوەر. |
| هام - عظيم | Important | گرنگ. |
| هامة الراس | Crown (top) of head | تەوقی سەر، تەپڵی سەر. |
| هامد - خامد - ساكن | Inert, Quiet | خامۆش. |
| هامور | | جۆرە ماسی‌یەکە. |
| هامش - حاشية | Margin | کەنار، دەرکەناری کتێب. |
| هامة، بعقة - أم الصخر | White owl = Barn-owl | شابوو، کوندەبەبوویەکی بچووکی سپی‌یە هێڵی رەشی تیادایە سەری زلە لە گۆڕستان و کەلاوەکاندا ئەژی هەر سەیری ئەملاو ئەولای خۆی ئەکات. |
| هامستر | Hamster | (هامستەر) گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە کەروێشك دەچێت کلکی کورتە دەغڵودان لە گوپی کۆ ئەکاتەوەو ئەی خاتە کونێکەوە لەژێر زەویداو هەڵی ئەگرێت بۆ ماوەی مت بوونی زستانەیی. |
| هامرة، مهشرة | | ئامرازێکە بۆ دەرهێنانی شیر لە گوانی مانگاو ناردنی بۆ قاپێکی قایم داخراو. |
| هاما ماليس | Hamamelis = witch hazel | فنقی دڵ رفێن، فنقی رازاندنەوە، گوڵی زەردی مەیلەو پەمبەیی دەگرێت بەرەکەی لە فنق دەچێت. |
| هانم - سيدة، خاتون | Lady | خانم- خاتوو. |
| ها هاة - قهقهة | Loud laugh | قاقای پێکەنین -پێکەنین بە دەنگی بەرز. |
| هاهنيوم | Hahnium | هاهنیۆم، توخمێکی کانزایی دەستکردە تازە لە لایەن زانای فیزیایی ئەڵمانی ئۆتوهانەوەدۆزراوەتەوە، ژمارەی گەردیلەیەکەی (١٠٥)و کێشی گەردیلەیی‌یە کەی (٢٦٠) نیشانەکەی (Ha). |
| هاوية - وهدة | Abyss | چاڵێکی قووڵ. |
| هاوين | Hauyne | هاوین، مەعدەنێکە بریتی‌یە لە گۆکردات‌و سلیکاتی ئەلەمنیۆم‌و کالیسیۆم‌و سۆدیۆم رەنگەکەی بەزۆری شینە، هەروەها خۆڵەمێشی، قاوەیی زەرد–سەوزە. |
| هاوية | Abyss | چاڵێکی قووڵ. |
| هاو سمانيت | Haucsmannite | (هاوسماننایت) کەرەسەیەکی خاوی مەنگەنیزە رەنگەکەی رەشی مەیلەو قاوەیی‌یە. |
| (هاوي) هاو | Amateur = lover | حەزکەر، ئارەزووکەر، مێمل،نەتەل،، بۆ هەوەس. |
| هاو - ساقط | Falling down | کەوتوو. |
| هاون مع يدة | Mortar and pestle | دەسك‌و دەسکەوان. |
| هاون - هاوون | Mortar | ئاوان، دەسکەوان، دوڵ، دەسك‌و دۆڵ، ئاونگ، هاوەنگ. |
| هادي | Quiet = calm | هێمن، لەسەرخۆ، مەنگ، بە ئارام، ئاسوودە، بێ دەنگ. |
| هايبو | Hypo-, Hyp- | (هایپۆ) پێشگرێکە بەمانای ژێر (تحت)، کەمتر (اقل). |
| هايبو | Hypo | هایپو، سۆدیۆم ثایوسولفەیت، هایپو سولفایتی سۆدیۆم کە لە وێنە گرتنی فۆتۆگرافدا بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| هايبوستوم | Hypostome | ( هايپۆستۆم)، لمۆز، دەمێکی بەرز. |
| هايبريون | Hyperion | هايپيريۆن/پاشکۆی هەسارەی کەیوانە، دووری لە ئەستێرەکەیەوە (١٠x٩٢٦[٢]) میلە،تیرەکەی (٣٠٠) میلە زانا بۆند لە ساڵی (١٩٤٨) دا دۆزیویەتیەوە. |
| هايبو كلوريت | Hypo | هايپۆکلۆریت، خوێی هايپۆکلۆرۆز ئەسید. |
| هايبو كوندريا | Hypochondria | هايپۆکۆندریا، ۆاس واسی نەخۆشی. |
| هايف | Hypha | دەزوولەی رووەکی کەڕوو. |
| هايبو تلاموس - ما تحت سرير البصري | Hypo Tha lamus | (هايپوثالامەس)، ژێر لانکەی بینایی-ناوچەیەکە لە مێشکدا لەژێر لانکەی بیناییدا رۆڵێکی گرنگ دەبینیت لە کاتی شلەژان و نوستن . هتد. |
| هايدروكس | Hydroxy | هايدرۆکس، ئاوێتەیەکی ئەندامی‌یە، کۆمەڵەی هايدرۆکسیلی تیایە، وەکو هايدروکس سۆدیۆم. |
| هايدروستاتيك | Hydrosta tics | هايدرۆستاتیك، زانستی هاوسەنگی شلەکان. |
| هايدرودنياميك | Hydrodyna mics | (هايدرۆدنیامیك)، زانستی جووڵەی شلەکان. |
| هايدروزوا | Hydrozoa | هایدرۆزوا ، کۆمەڵە گیاندارێکی ساکاری دەریایی‌یە وەکوو گیانداری ئۆبیلیا، |
| هايدرا - عذار | Hydra | (هـايدرا)، جـۆرە گیـاندارێکی سـاکاری دەریایی‌یـە، لـە کۆمەڵـەی بـۆش ریخۆڵەیی‌یـەکان وەکـوو بۆری‌یـەکی بـاریك وایـە بەشـێوەیەکی رەگـەزی‌و نارەگەزی زیاد دەکات. پێستەکەی زۆر تەنکە هەندێکی لە ئاوی شیریندا دەژی. |
| هايدرا، عذار - حيوان مائي اخچر | Hydraa | هايدرا- گیانداری ئاوی سەوز- گیـاندارێکی ئاوی‌یـە لـە کۆمەڵـەی بۆش ریخۆڵەیی‌یەکان شێوەیەکی لوولـەیی هەیـە (٢-٢٠ ملـم) درێـژە بـە قـەدی گەڵای رووەکی ناو ئـاوەوە دەنووسێت، سـەرەکەی دەمێکـی تیادایـە بـە (٦٠-٨٠) هەستەوەر دەورە دراوە. |
| هايدرومتر - مسيل | Hydrometer | (هايدرۆمەتر)، پێوەری کێشی جۆری شلە. |
| هايبوسلفات الصوديوم | Sodium hypo- sulf ite | (هايپۆ)، سۆدیۆم هایپۆ سولفەیت، سۆدیۆم ثایوسولفەیت، مادەیەکی کیمیایی سپی‌یە بەشێوەی دەنك هەیە بۆ مەبەستی وێنەگرتنی فۆتۆگرافی بەکاردێت. |
| هايكرومترية | Hygro metry | هایکرۆمەتری-زانستی پێوانی شێی کەش. |
| هايكرومتر - مرطاب | Whirligig hydro meter | شێ پێو، ئامرازێکە بۆ پێوانی شێی ناو کەش. |
| هايشة - هركول | Rorqual | نەهەنگی سوور-نەهەنگێکی زۆر گەورەیە. |
| هايدروزنكيت | Hydro zincite | هایدرۆزینکـایت، مەعدەنێکـە بریتی‌یـە لـە کاربۆنـاتی زینکـی ئـاویی، رەنگەکـەی سپی مەیلـەو خۆڵەمێشـی، یـان مەیلـەو زەرد لـەیلاقی کـاڵ، کەرەسەیەکی خاوی ناوەنجی زینکە. |
| هايدرو مغنيسيت | Hydromagnesite | هایدرۆماگنیسایت، مەعدەنێکە بریتی‌یە لە کاربۆناتی مەگنیسیۆمی ئاویی بێ رەنگە یان سپی‌یە. |
| هايراكس - وبر طبسوم - زلم | Hyrax = coney = shrew mouse | هایراکس، کۆلکن، دامان ، گیاندارێکی شیردەری بچووکی سمداری قەڵەوی کورتی قرتێنەرە، بە قەدەر کەروێشکێك دەبێت، رەنگەکەی قاوەیی مەیلەو رەشـە، پـەل و گوێچکـەکانی کورتـن، کلکەکـەی پوکاوەیـە، پەلـەکانی لبادەیەکی نەرم و چرنووکی پانیان پێوەیە، گیاندارێکی چوست و چالاکە، دەتوانێـت لـە ئاسـتی خۆیـدا بـۆ سـەرەوە بـازبدات و بـە بـاش لـە هاتنـە خوارەوەدا خۆی بگرێتەوە، لە قەدپاڵی چیاکان و ناو بەردەڵانیدا دەژی ، لە لوبنـان و خۆرهـەڵاتی میسـر و سـودان و حەبەشـەدا دەژی مادەیـەك ٠.٥.١ دەدات لەو مادەیە دەچێت کە سەگڵاو دەریدەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| هباء | Dust = fine dust | فیزو، خۆڵ، تەپەتۆز. |
| هباء | Aerosol | (ئێروسۆل)،پرژی کەش، بریتییە لە مادەی ئەندامیو نائەندامی وەکو خۆڵو خوێو باکتریا و هەڵاڵەی گوڵ، کە با بۆ ماوەی دوورو بەرزی نزیکەی (٢) کیلۆمەتر هەڵیان دەگرێت. |
| هباء جوي (دخان، ضباب) | Aerosol | تەمی ناو هەواوەکوو دووکەڵو تەپوتۆز- تۆزی ئاسمانی. |
| هبـــــار، قـــــرد مقدس، ليمور | Solemn apes = simpai = lemur = macaco | سەگسار، مەیموونی تیسکن، مەیمونی قنگ سوور، جۆرە مەیمونێکی کلک درێژە لە ڕێوی ئەچێت، پەرۆزە لای هیندییەکان. |
| هباري - حباري | Bustard | چێرگ ، باڵندەیەکی گەورەیە گۆشتەکەی خۆشە. |
| هباية | Dry peels | ریشاڵی درەخت، توێکڵی درەخت. |
| هباب، هباء اسود | Soot = smut | رەشی مەنجەڵ، دوورینج، دووژینگ، تەنی. |
| هبالة | | درەختێکە لقەکەی تیروکەوانی لێ درووست ئەکرێت. |
| هباط الضغط | Hypotensor | پەستان، هێنەرەخوار، - هەر دەرمانێك پەستانی خوێن بهێنێتە خوارەوە. |
| هبال، مرموزة | Marmoset | مارمۆسێت، مەیمونێکە لە ورچ ئەچێت، بچووکو شێوە جوانە سەری خڕە، کلکی تیسکنە. |
| هبة | Agust | پف، فوو. |
| هبة، هدية | Gift, present | بەخشین، بەخشیش، دیاری ، باربۆ. |
| هبة ريح | Agust = sudden blast of wind | هەڵکردنی با. |
| هبر - مشاقة | Bass = bast | ئەو ریشاڵەی کە لە قەدی رووەك دەردەهێنرێت وەکوو گوشو کەتان. |
| هبر، هبرة | large stices of meat, a lump of meat | وڵمە، کوڵمە گۆشت، گۆشتی نەرمە، نەرمك، ران، پارچەی گەورە لە گۆشت. |
| هبر | Diacope | (دیاکۆپ) ماسییەکی گەورەی پانکەلەی شینی مەیلەو بنەوشەییە. |
| هبرية - مبارية | Dandruf = scurf | کرێشی سەر، قەلێر، گەمارە، گەمرە، قرێژ. |
| هبرسية | Hibber tia = rock roses | هیبەرسیا-رووەکێك بۆ رازاندنەوە. |
| هبطة - نزلة | Descent | پسان، ئاسان، خوریە. |
| هبطة - سقطة | A fall | کەوتن. |
| هبط - اهباط - تنزيل | Reducing | داشکاندن- هێنانە خوارەوە. |
| هبع، حمار اسود | Black ass | کەرە رەش. |
| هبل - بله | Idiocy = Imbecility | گێژی، شێتی، حۆل. |
| هبل - عملاق | Giant = a tallman | زەبەلاح، لۆزەندەر، چەتەول، زەلامێکی کەتەی درێژ. |
| هبل | Strelitzia | گیایەکی ناوچە گەرمەکانە، گەڵاکەی گەورەیە گوڵی زەرد یان ئەرخەوانی هەیە. |
| هبلع | Grey hound | تانجی، سەگێکی باریکەڵەی سووکەڵەی راوی پێدەکرێت. |
| هبهاب، سراب | Mirage | سەراو، سەراب |
| هبوبو الريح | Blowing of wind | هەڵکردنی با، با هەڵکردن. |
| هبوط - انهيار | Subsidence | داکەوتن، دابەزین. |
| هبوط القلب | Coma | بوورانەوە، خوریەی دڵ، دڵ دلکەوتن، هەناو کەوتن، پسانی دڵ، ئاسانی دڵ. |
| هبوط التوتر - نخفاض - ضغط الدم | Hypotension | نزم (کەم) بوونەوەی پەستانی خوێن. |
| هبور - عنكبوت | Spider | جاڵجاڵۆکە،تەقنیپرك. |
| هبيج | Gazelle | جۆرێکە لە ئاسکە کێوی. |

| | | |
|---|---|---|
| هبيري | Truffle | جۆرێکە لە دومەڵان. |
| هبيت - عبيط | Idiot = dolt = booby | گێل، حۆل. |
| هتاف = صياح | Cry = shouting | هاوارکردن- قیژاندن. |
| هبرة = ضبع | Hyena | کەمتیار، گیاندارێکی درندەی گۆشتخۆرە لە گورگ دەچێت. |
| هتامة جزيء =كسرة | Particle, chip, fragment | بەش، پارچۆلکە. |
| هتر - خرف | Dotage, imbecility of mind | خلە فاوی، حۆلی. |
| هتف | Cry , shouting | هاوارکردن، بانگ کردن، خوێندنی بالندە. |
| هتك | Disclosure, exposure | دراندن، زڕاندن، ئاشکرا کردن، ئابڕوبردن. |
| هتك العرض | Rape, ravishment | دراندنی عەرز، خراپ کردنی کچ. |
| هتر - السقط من الكلام | Drivel, nonsenes | قسەی پڕوپووچ. |
| هتر - هذيان | Delirum | وڕێنە. |
| هتن - مطر متتابع | Down pour | لێزمە، باران، ڕەهێڵە، تاوی بارانی ، یەك لە دوای یەك. |
| هتون | It rained Copiously | هەوری باراناوی. |
| هتونية | Hottonia | (هۆتۆنیا) گیایەکی ئاوییە گەڵاکەی ئاوێتەیە لە پەڕ ئەچێت، گوڵـی سوور یان خاکی ئەگرێت، بۆ مەبەستی ڕازاندنەوە بەکاردێت. |
| هتيكة - فضيحة | disgrace = scandal | ئابڕوچوون. |
| هجان - صاحب الجمل | Cameldriver | حوشترەوان |
| هجاس سوداوي | hypo chondria | (هـايپۆ کۆندريـا) بـارێکی نەخۆشـیە ئەوکەسـە زۆر بـێ ئـارام دەبێـت دەربارەی تەندروستی خۆی. |
| هجر | Ectopia = Eclopy | ترازان، خزان. |
| هجر القلب | Ectoplacardia | دڵ خزان- دڵ ترازان-داخزانی دڵ لە جێی خۆی. |
| هجر، هجرة. | Emmigration = ForsaKing | کۆچ کردن، بەجێ هێشتن، ڕەوکردن، کۆچ وەکوو کۆچ کردنی پەرەسێلکە بۆ ناوچە گەرمەکان لە کاتی زستاندا. |
| هجرس، كيبس، كبوش سعادين - نسناس | Cebus = Capuchin = cephus = tailed apes = lasiopyga | ١) بەچکە ڕێوی ٢) کاپوشین، جۆرە مەیمونێکی حەبەشی بچووکی ڕەنگینی کلك درێژی کلاودارە. |
| هجرس - أحمر | Patas | پاتاس- مەیمونی کلاوداری سوور. |
| هجرس اصفر | Green monKey | مەیمونی زەرد. |
| هجرس اخيضر - فرفت | Vervet | ڤێرڤێت، مەیموونی کلاوداری سەوزی مەیلەو زەرد. |
| هجرس البحيرات | Brazza monKey | مەیمونی براز= مەیمونی دەریاچەکان. |
| هجرس الغاب | Nisnas | (نیسناس) مەیموونی دارستان. |
| هجس | Nonsense | نەنگی، پڕوپووچ. |
| هجرس سبا، شادي، عبلنج - طوت | Grivet | گریڤێت، مەیمونێکی حەبەشی بچووکە. |
| هجرع - سلوقي | greyhound | تانجی، سەگی ڕاو. |
| هجنة - عيب | Defect | ١) بەبیرهاتن٢)قسەیەك بێ بیستی و تێ‌ی نەگەیت. |
| هجنة - غرابة | Strange ness | سەیر، شتێك سەیر بێت. |
| هجوم | AttacK = rush | هێرش، پەلامار، شاڵاو. |

| | | |
|---|---|---|
| هجوم ليلي | Night rush | شەبەیخون، هێرشی شەو. |
| هجوع - نوم | Sleep = slumber | نووستن، خەوتن. |
| هجير = بحيرة | Lake | دەریاچە. |
| هجيرة = هاجرة | Midday = menidian | نیوەڕۆ. |
| هجين - مهجن | Cross bred Hybrid = metis | دوو رەگ، هەمە چیزە، دوو رەھ.<br>١-لە گیاندارەدا.<br>٢-لە ڕووەکدا. |
| هجين الذئب والثعلب | | گورشاڵ، گیاندارێکە لە نێوان گورگ و ڕێوی‌دایە. |
| هجيع من الليل | Adivision of the night | بەشێك لە شەو. |
| هجين رزوناتي | Resonant | دوو رەگی ریزونانتی، دوو رەگی زرنگانەوە. |
| هجينسونيت | Hutchinsonite | (هەچینسۆنایت) مەعدەنێکە چەند توخمێکی تیادایە، لەوانەش ثالیۆم، بلوورەکانی بەزۆریی لەگەڵ کۆگردیدەکان و سفالیرایت و پایرایت و ریلجارو ئۆرپیمینتدا دەبینرێت. |
| هداد - رفق و تان | Gentleness | بە شێنەیی. |
| هدار - مئزاب | Millrace | پلووسك- وەکوو پلووسکی ئاش. |
| هداف - نشانجي | Agood shot = marKsman | نیشانچی، نیشانەگرەوە. |
| هداء - حمام زاجل | Carrier pigeon | کۆتری نامەبەر. |
| هدال | Mourning dove | کۆترە کێوی ئەمەریکی. |
| هدال = دابوق - دبق | Mistletoe = bird lime | دەمووکانە، دەمکە، ڕووەکێکی مشەخۆرە لەسەر لقی درەختی بەردار ئەژی زیانی پێ ئەبەخشێت ، بەرەکەی ناوك دارو سپی و لینجە ، باڵندە بەرەکەی ئەخوات. |
| هدام، مرض البحر - دوار البحر | Sea SicKness | سەرەگێژەی دەریا، سەرە خولێی دەریا. |
| هداب الثوب (حاشيته) | Fringe | قەراغی کراس. |
| هدابة، فيلارية | Filaria | (فیلاریا) جۆرە کرمێکی دەزوولەیی‌یە تووشی مرۆڤ و گیاندار ئەبێت ، لە کۆئەندامی خوێن و گەدەو خوارەوەی لاق و مل و شاندا دەژی. |
| هدب | Cilium | برژانگ، ڕێشوو. |
| هدبي - مهدب | Ciliated | ریشوودار. |
| هدبة | Eyelash = Needle = cilia | برژانگ، برژۆك، مژانگ. |
| هدب(للعين) | Fimbria | ڕێشوو، قەلاسی جۆ، موویەکی درێژی تیژەبە دەنکی جۆوە. |
| هد | Demolition = pulling down | تەکاندن، ڕووخاندن، رماندن، هەرفاندن. |
| هدبة، حمار قبان | | بگەڕێرەوە بۆ (حمار قبان). |
| هدبيات | Cilia = Ciliata | گیانداره برژۆڵدارەکان. |
| هدبية الأذناب | Bristle tallea | کلك برژۆڵ دارەکان ، کۆمەڵێکن لە مێروو برژۆڵی باڵیان نی‌یە ، لەشیان برژۆڵی پێوەیە، لە سەرە میکۆتە ئەچن، هەروەها کلکیان برژۆڵی پێوەیە. |
| هدبية الأجنحة | Thysanopt erra | باڵ برژۆڵدارەکان، کۆمەڵێکن لە مێروو باڵیان برژۆڵی پێوەیە. |
| هدبية الأرجل - هدابيات الأرجل | Cirripedia | پێ برژۆڵدارەکان پلەیەکە لە گیاندارە توێکڵدارەکان وەکوو قرژاڵ. |
| هدة - هرطمان | Oats | کزن ، ڕووەکێکە بەرەکەی دەدرێت بە ئاژەڵ. |
| هدر - باطل | Invain = uselessly | بەخۆڕایی- بەهیچە. |
| هدرة | | جۆرە ڕووەکێکی هەمیشە سەوزە، مادەیەکی زۆر تاڵی تیایە. |

| | | |
|---|---|---|
| هدرة ، عدار | Hydra | بگەڕێرەوە بۆ (هایدرا). |
| هدرجة | hydrogenation | هایدرۆجین کردن ، هایدرۆجینێن ئەوەیە کە مادەی هایدرۆجین بکرێتە مادەیەکی ترەوە، وەکوو رۆنی رووەکی ، بۆ توند کردنەوەی. |
| هدریات - عذاریات | Hydr oidea = hydroid | هایدرۆیدییەکان، کۆمەڵە گیاندارێکە لە لقی بۆش ریخۆڵەییەکان. |
| هدرنجیة = کوبیة | Hy drangea | (هایدرانجیا) ، دەوەنێکە بەرەکەی لە کوپی شاو دەچێت بۆ رازاندنەوە دەروێنرێت. |
| هدریس - قضاعة - ثعلب الماء | Kalan = Sea Otter | رێوی دەریا، گیاندارێکی شیردەری دەریاییە پێستەکەی رەش و بە نرخە، لە سەگلاو دەچێت. |
| هدف = غرض | Object = aim = objective = goal | ئامانج، نیشانە، مەبەست. |
| هدف الرماية - درئية | Target | نیشانە، کولیك، ئارمانج. |
| هدل - هديل | To Coo | قووقە، قووقە قووق، وەقوە وەقوو، گمەگم، دەنگی کۆتر. |
| هدل | To droop | شۆڕبوونەوە. |
| هدم - تخريب | Demolition | رووخاندن، رماندن، هرفاندن. |
| هدنة - فترة - وقوف | Quietness = To suspend hostilities | ئاشت بوونەوە، رێکەوتن، وەستانی شەڕ. |
| هدهد | Hoopoe = coffin bird | پەپو، پەپوو سلێمانکە، هەپو، باڵندەیەکی هێڵ داری رەنگینی کلاو بەسەرە. |
| هدهدة | To rock a baby | راژەندن،، راژەندنی منداڵ بۆ ئەوەی بنوێت. |
| هدوء | Silence, quietness | هێمەنی، ئەسپایی، بێدەنگی، ئارام، ستار، ئۆقرە. |
| هدوم - ملابس | Clothes | جلوبەرگ. |
| هدية - منحة | Gift, present | دیاری، سەوقات، بەخشیش. |
| هدية | Present = offering | دیاری. |
| هدية الزواج | Wedding present | دیاری ژن هێنان. |
| هدية المسافر - لهنة | A coming home Present | دیاری ئەو کەسەی کە لە سەفەرەوە دێتەوە. |
| هدير | Roar = rumbling | گرمەگرم، گرماندن، مراندن، وەکوو مراندنی شێر. |
| هديل - ذكر الحمام | Dove male tocoo | ١)کۆتری نێر، نێرەکۆتر٢) خوێندنی کۆتر. |
| هديوتيس - قرانيا | Dog wood | رووەکێکی دەشتەکی و کشتوکاڵییە بە شێوەی گیاو دەوەن، گەڵاکەی بۆن خۆشە عەتری لێ دەردەهێنرێت هەندێکی، رەنگی سوور لە رەگەکەی دەردەهێنرێت، تەختەی سەگ، دارسەگ. |
| هذاب | Mesites | میسایتس، باڵندەیەکی مام ناوەندییە لە کۆمەڵەی مریشك، پشتەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە، ژێر سکی زەردەو هێڵی رەشی تیادایە، ملی زەردێکی کاڵە، کلکی کورت و قوچەکییە. |
| هذب - تهذيب | Touch up = retouch | چاك کردن. |
| هذب | | غارکردن، تاوی غار، غارکردنی ولاخ. |
| هذر | Non sence = prattle | قسەی پڕوپووچ، زۆر وتن، چەنەبازی. |
| هذلول - تل صغير | HillocK | گردۆلکە. |
| هذلول - مسيل الماء الصغير | streamlet | جۆگەلە. |
| هذى - هذيان - هذاء - خطرفة | Raving = balderdasn | وڕێنە، بزرکاندن. |

| | | |
|---|---|---|
| هذيان الحمى | Delirium | وڕێنەی تا. |
| هذيـان - بطـاح - هذيان الحمى | Delirium = febrile-delirium | ووڕێنە، بزبکاندن، ووڕاوە، ووڕێنەی تا. |
| هرء = هرء | Overdone, lacerated | داڕزان، داوەشان. |
| هراس الشمس = السنة الشمس | Sun dogs, mocksuns | زمانەی خۆر، دیاردەیەکی سروشتی زۆر جوانە، لـە ناوچـە پۆڵـیەکاندا روو دەدات. |
| هرامة = فرامة | Chopper | ماکینەی گۆشت= گۆشت جن، ئامرازێکە بۆ جنینی گۆشت بەکاردێت. |
| هر،هرس، قـط،بس، سنور، سنار، خيدع، خيطل، دمة، مخدش، ابو غزوان، قطة | Cat | پشیلە،کتك، کێتك، گوربە، پشیك، پسیك. |
| هراب السفينة | Keel | بنکی پاپۆڕی خەڵوز گواستنەوە. |
| هراء | Hooey | هیچو پووچ. |
| هراس،سنط أبيض | White acacia | ئەقاقیای سپی، ئەکاسیای سپی، درەختێکە (٤٠٠) جۆری هەیە ، لە ناوچە ئاوییەکاندا دەژی بۆ ڕازاندنەوە بەکاردێت. |
| هراسة، اداة الهرس | Masher | مەکینەی چنین یان فلیقاندنەوە، وەکوو هی پەتاتە. |
| هراوة | Cudgel = Truncheon = club | لیس، چوخماخ، چوماخ، گوند، گورز، تۆپز، کوتەك، تێلاتەیاخ، زۆپە، تیلاً. |
| هرب - هروب | Flight = escape = getaway | راکردن. |
| هربول | Pseudope | جۆرە مارمێلکەیەکی بە سوودی بێ پەلە، لەشەکەی لوولەییە، سەری پانە کلکی باریکە. |
| هر بري | Wild cat | پشیلە کێوی. |
| هربون،درقة | Sculellaria | رووەکێکە گەڵاکەی بەشێوەی هێشووە، سپی یان بنەوشەیی یان شینە، تۆوەکەی وردو گەنم ڕەنگە. |
| هربش - هرض - هرص | Herpes Zoster | تامێسك، جۆرە زیپکەیەکی بە ئازارە لەسەر لەشدا پەیدا دەبێت. |
| هربذة - - خبب قصيرة | Short trot | لۆقەی کورت-لۆقەی وولاخ. |
| هرتز | Hertz | (هێرتز) یەکەی لەرلەر(تردد) کە دەکاتە یەك خول(Cycle) لە چرکەیەکدا. |
| هرتبيس، نو | Wild beast, gnu | نوو جۆرە گاکێوییەکی کەتەیە لە ئەفریقا دەژی. |
| هرجلة - عدم انتظام | Chaos = disorder | ناڕێکی. |
| هرجل - اختلط - مشية | To shamble | کەسێك قاچی تێکەڵو پێکەڵ ببێت لە کاتی ڕۆیشتندا. |
| هرجل | To stride, To shamble | لۆقن لوق درێژ، ڕۆیشتن بە ناڕێکی. |
| هرج | Commotion, disorder | هەرا، هەراوهوریا، دەنگە دەنگ. |
| هرج ومرج | Tumult, agitation | هەراو هوریا. |
| هرد - كركم صباغي | Long rooted Curcuma = Tumeric | زەردە چەوە، رووەکێکە ڕەنگێکی زەرد لە ڕەگەکەی دەرئەهێنرێت بۆ ڕەنگ کردن بە شێوەی بەهارات بەکاردێت. |
| هربشت - سقط الكلام | Bladerdash nonsense | قسەی پڕوپووچ، قسەی بێ کەڵك. |
| هرداء - هردان - خيزران | Bamboo | حەیزەران، دارێکە لقەکانی دەکرێن بە گۆچانو کەلو پەل هەروەها لە بیناکردندا بەکاردێت. |
| هرزان - ظليم | Ostrich (male) | نێرە ووشتر مڕ. |
| هرس - عصر | Crushing | کوتان، ووردکردن، فلیقاندنەوە، ووشین، گوشین. |
| هرش - حكة | Pruritus | خروو، خوراندن. |

| | | |
|---|---|---|
| هرشان، اكلان | Itching | خروو، خوورو. |
| هرشفة - قطيلة | Swab = mop | كسك، سڕەر، كەسكی بچووك، بۆ سڕینەوەو لابردنی دەرمان. |
| هرشان | Caragna | دەونێكە گەڵاكەی ئاوێتەیە لە پەڕ ئەچێت گوڵەكـەی زەردە، بەرەكـەی لـە بەری فاصوڵیا ئەچێت. |
| هرص | Tetter | نەخۆشی‌یەكی پێستە، هەندێك جۆری هەیە لە گیاندارەوە دەچێت بۆ مرۆڤ. |
| هرص - جاورسية - هرض = دخنية - حصف | Prickly = heat = millaria | گرمژنـە، گەرمەژنـە،گرمـژك. سـووتانەوەی پێسـت بـە خوروئـارەق كردنەوەیەكی زۆرەوە. |
| هرط | | چەق، گۆشتێكی لەڕی لینج. |
| هرطمان حية . | SnaKe hurtuman | پۆلكە لاسورە. |
| هرطمـان، جلبـان، خرطال بري، شوفان بري، خافور - جلبان - حب الضراط | Wild oats = vetch two flowered vetching = India-pea = grasspea = ChicKing Vetch = Fart seed | كزن، ، كاڵتـاس، گادانـە، رەمەدانـە، دێمیلـە، گـەڵا بریشـی، گیا بریشـی، هەرزن، كاگۆز، گاڵ، كێلینە، پۆلكە خاتوونە، تۆوێكی ناوەنجی‌یە لەنێوانی گەنمو جۆدا لەناو كێڵگەدا دەڕوێت. |
| هرع | | راجع (هستريا). |
| هرفغ - بوم ابيض | Nyctea nivea | كوندەبەبوری سپی، جۆرێكە لە كوندە بەبوو، رەنگەكەی سپی‌یە دەنووكی رەشە، چاوی سوورە. |
| هرڧ - بكر | Firstling | كاوڕ، نوخشە، نۆبەرە. |
| هرق - إهراق | Pouring out | رشتن. |
| هرقل، عصا الراعي | Hercules | گۆچانی شوان، رووەكێكە رەگو تۆوەكەی بۆ میزكردنو فێ باشە. |
| هرقل - جاثي | Hercules | (هەرقل)، كۆمەڵە ئەستێرەیەكە. |
| هرقة - عجوز شمطاء - حيربون | Crone | پیرێژن. |
| هرقلية | Haracleum = Downy Cow parship= Meadow Parsnip = Cow parsnip hog weed | هەرقیلی - گیابەرازە، گێزەری گیا، گیایەكی گەورەیە، گەڵاكەی لە گەڵا مێو ئەچێت گوڵەكەی سپی‌یە بۆ دروست كردنی جۆرێك لەمەی كە لە بیرە ئەچێت.،سەفەندلیون. |
| هركل - قندس - كلب الماء | Beaver = caslor | سەگلاو،گیاندارێكی ئاوی قرتێنـەرە، پێستەكەی بـە نرخـە لقـی درەخت دەبڕێتەوەو هێلانەی لێ دروست دەكات. |
| هركول، منـارة - هايشة | Fin whale = Rorqual = Fin bacK = Finner whale | جۆرێكە لە نەهەنگ زۆر گەورەیە سەرەكەی زلە، رەنگەكەی خۆڵەمێشی یان شینە، سكی سپی‌یە، پەڕەكەیەكی گەورە وابە پشتییەوە. |
| هرم | To become decrept | پیر، بەساڵاچوو. |
| هرم | Decre pitude | پیری، بە ساڵاچوون. |
| هرمة، عجوز شمطاء، حيذبون | Cnone | پیرێژن |
| هرم | Pyramid | پۆپـەتیژ، شـەپیوور، چوققـە كووچـەك، تـەنێكی ئندازیاری‌یـە بەچـەند رووبـەكی سـێ گۆشـەیی دەورە دراوە، سـەرەكانیان لـە یـەك خـاڵدا كۆبونەتەوە، یەكێك لە ڕووەكانی پێی دەوترێت بنكە (قاعدة). |
| هرمون - هورمون - حاثة | Hormone | (هۆرمۆن) مادەیەكی شلە لە لایەن هەندێك ئەندامو لوەكانەوە (بەتایبەتی لوە كوێرەكان) دەر دەرێتە خوێنەوەو كار دەكاتە سەر گەشەكردنو چالاكی لەشی مرۆڤ وەكوو ئەنسولینو ئەدرینالین. |
| هرمون النمو - اكسين | Auxin | ئۆكسین-هۆرمۆنی گەشەكردن. |

| | | |
|---|---|---|
| هرمون ذكري | Androgen | (ئەندرۆجین)، هۆرمۆنی نێرینە، ئەو هۆرمۆنەیە کە لە گوندا پەیدا دەبێت و رەوشتی رەگەزی نێر دەردەخات. |
| هرمون الغدة الدرقية | Thyroxin | (ثیرۆکسین) هۆرمۆنی لووی قورقوراگە . |
| هرمون المبيض | Estrogen | ئێستروجین، هۆرمۆنی هێلکەدان، ئەو هۆرمۆنەی کە هێلکەدان دەری دەدات. |
| هرمون الخصية | Testosteron | تێستۆستێرۆن، هۆرمۆنی گون، ئەو هۆرمۆنەی کە گون دەری دەدات. |
| هرم ناقص | Frustumof Pyramid | شەیپووری ناتەواو- شەیپووری بڕاوە. |
| هرمي = محكم السد | Hermetic | قایم داخراو. |
| هرملة، تروتة | Truite | ماسی‌یەکە لە ئاوی شیریندا دەژی. |
| هرمي | Pyramidal | شێوە شەیپووریی. |
| هرميس،كركدن ابيض، هرميس،جريش، كركدن | Rhinoceros white | کەرکەدەنی سپی، یەك شاخەی سپی. |
| هرمين، قاقم | Ermine | قاقوم، زالْ ، ژالْ، گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە، پێستەکەی بە نرخە. |
| هرنوع | Boletus | (پۆلیتەس)، جۆرێکە لە قارچك،ئەمیش چەند جۆرێکی هەیە، هەندێکی ئەخورێت و هەندێکی ژەهرینە. |
| هرنوي، هرنوة | Corn grass = Silky bent grass = wind grass | گیایەکی دەشتەکی‌یە لە کۆمەڵەی دەغڵ‌ودان لەناو کشتوکاڵدا دەروێت، بۆ لەوەڕ باشە. |
| هرنوة - عود الطيب - فليفلة | Aloexylon agallochum, aquilaria, agallocha | داری عوود، درەختێکە ئەگەر لقەکەی بسووتێنرێت بۆنێکی خۆش ئەدات. |
| هرهير | | ١) جۆرێکە لە ماسی.<br>٢) جۆرێکە لەمار.<br>ماسی‌یەکی دەریایی پەڕەکە دڕکاوی‌یە لەشەکەی بچووکە پانکەلەیە، چاوی گەورەیە ، رەنگەکەی قاوەیی‌یە ، گۆشتەکەی ئەخورێت. |
| هروب | Escape, run away | راکردن، هەڵاکردن. بگەڕێرەوە بۆ (هرب). |
| هروب من الجندية | Desertion | راکردن لە خزمەتی سەربازیدا. |
| هروب الرجل مع امراة او بالعكس | Elopement | راکردنی پیاو لەگەڵ ژندا، پیاوێك ژنێك هەڵبگرێت یان بیرفێنێت یان بە پێچەوانەوە، رەدووکەوتن. |
| هرولة - خبب | Festination = aquich (or), hasty walK | لۆقە، رەوت، رارکردن یان رۆیشتن بە خێرایی. |
| هروين | Heroin | هیرۆین، مادەیەکی سڕکەرە لە مۆرفین دەردەهێنرێت. |
| هــري، - شــونة - مخزن الغلة - انبار | Corn loft Granary = Silo | عەماری دەغڵودان- سایلۆ، کەندوو. |
| هريء - مهتري | Lacerated = tattered | داڕزاو،داوەشاو،داڤەرتاو. |
| هري - مخزن مزرعي | Barn | گەنجینەی کشتوکاڵی. |
| هديت واسع الفم | Wide mouthed | دەم زل. |
| هريس | Mash | کوتراو، ووردکراو، فلیقاوە، جنراو. |
| هريسة | | کەشکەك، پەڵێك- لەپەتەتیر، شلەپەتە، خواردەمەنی‌یەکە لە گەنمی کوتراو و گۆشت دروست ئەکرێت، گەنمە کوتاو. |

| | | |
|---|---|---|
| هريجة - مازريون هندي | Clitoria ternata = blue clitoria | قيتكەيى، دەوەنـى قيتكـە، دەوەنێكـە گوڵەكـەى لـە قيتكـە دەچێـت، بـۆ گوڵەكەى دەروێنرێت. |
| هريرة - قدة | Catkin = ament | پشيلۆكە، شێوازێكى گوڵ كردنە لە شێوە پشيلە دەچێت وەكوو شكۆفە گوڵى گوێزو بى و چنار ..هتد. |
| هرير الكلب - نباح | howl | وەڕينى سەگ، قروسكاندن. |
| هرير القط - خرخرة | Purr | مياواندن، كوركاندن، (مياواندنى پشيلە) |
| هريعة | Shield wort | گيايەكە گوڵەكەى سپىيە بەرەكەى لە بەرى خەرتەلە دەچێت، گەڵاكەى بۆنى سيرى لێ دێت، بۆ مەبەستى پزيشكى بەكاردێت. |
| هريات | Amenta ceae | پشيلەيىيەكان، ئەو ڕووەكانەى كە شێوەى گوڵە نێرەكانيان لەشێوەى پشيلە دەچێت، وەكوو كۆمەڵەى بەڕوو بى و گوێز . هتد. |
| هزار الحائط - حميراء | Redstart | عەينەمەلى ديوار، باڵندەيەكە لە كۆمەڵەى ڕيشۆڵە. |
| هز | Shaking, Trembling, Rattling | ڕاوەشاندن، ڕاژندن، ڕاتەكاندن، تەكاندن، لەراندن. |
| هزء - استهزاء - مهزاة | Derision = mockery | گاڵتە پێكردن. |
| هزال | Enatiation = Atrophy | لاوازى، لاتى، لەرى، چرووسانەوە. |
| هزار،عندليب - ابو هارون | Nightingale = Sprosser | چورە بازارى، عەينەمەل،هەزار، باڵندەيەكى كەڵو ڕەشى خۆشئاوازە لە كۆمەڵەى بولبول. |
| هزار - هزل | Joking, dirision | گاڵتەكردن. |
| هزان | Hoazin | هوازن، باڵندەيەكە لە عەلى شيش ئەچێت بۆنێكى ناخۆشى لێدێت، سەرى پەڕى پێوەيە ڕەنگەكەى قاوەيى و مەيلەو ڕەشە، ملى سپىيە بەشێوەى پۆل لەسەر درەختى گوێ ئاوەكان ئەژى. |
| هزار | Rocking = shaKing | لەراوە، لەرزيىو. |
| هزازة - ارجوحة | Swing | جۆلانە. |
| هزاز الذنب - ذعرة. | Wagtail | كلك هەل سەنگێنە، كلك هەل تەكێنە.باڵندەيەكى بچووكە كلكى زۆر درێژە بەردەوام كلكى بەرزو نزم دەكاتەوە وەكوو بترسێت وايە. |
| هزبر | Lion | شێر. |
| هزة - رجفة | Trembling | لەرە، لەرين، تەكان، هوژم. |
| هزة الجماع | Orgasm = emotional parotysm | لەرزى دواى جووت كردن -مووچركى دواى جووت گرتن، لوتكەى چێژ وەرگرتن لە كاتى جووت بووندا. |
| هزة ارضية زلزلة | Earthquake | بوومە لەرزە، زەوىيە لەرزە. |
| هزر - هزل | To joke = jest | گاڵتەكردن. |
| هزل - هازل - هزال | Joker = jester | گاڵتەكەر. |
| هزل - مزاح | Joking = jesting | تز، گاڵتەكردن، گاڵتە پێ كردن. |
| هزلي | Laughable | تزكار، گاڵتەكەر، گاڵتەچى، قۆشمە، سوعبەتچى، قەشمەر. |
| هزلية غنائية - اوبريت | Operette = musical comedy | ئۆپەرێت، گۆرانى گاڵتەجارىى. |
| هزم | To rout | ڕاونان، شكاندن. |
| هزمة | LeuKoma = Cataract = cornea opacity | پەڵە، تانەى سەرچاو. |
| هزيل | Emaciated = very lean | جوقنە، جيقن، لاواز، لەر، ڕەقەڵە، بەلەباريكە. |

| | | |
|---|---|---|
| مزيم - رعد | Thunder | ناڵە، شریخە، گرمە، وەکوو ناڵەی هەورو هەورە تریشقە. |
| مزيمة انهزام | Defeat | شکان لە شەڕدا. |
| مزيع من الليل | Division of night | بەشێك لە شەو. |
| مسباريس - زهرة المساء | Hesperis | هێسپێریس، گوڵە ئێوارە گوڵێکە لە کۆمەڵەی خاچی‌یەکان لە ئێواراندا دەگەشێتەوەو بۆنو بەرامەیەکی خۆش دەداتەوە. |
| مستامين | Histamine | (هیستامین) مادەیەکی ژەهرینە لە شانەی مردوی لە شەوە پەیدا دەبێت، دەبێتە هۆی نزم بوونەوەی پەستانی خوێنو فراوانکردنی دەزوولەکانی خوێنو پترکردنی دەردانی دەردراوەکانی گەدە، لەم ساڵانەی دواییدا دەرمان بۆ چارەکردنی دۆزراوەتەوە. |
| مستيراني - هرعاني | Hysteroid | نیمچە هیستریای، کارێك لە هیستریا بچێت. |
| مستيريا - هرع | Hysteria | (هیستریا)، پڕکام، بەرکەم، پشێوی‌یەکی دەماری‌یە، هەندێ جار نۆرەی گریانو پێکەنین لە گەڵدایە بریتی‌یە لە ترسێکی یەکجار زۆر کە بە زەحمەت دایین دەکرێت. |
| مستيري - هرعي | Hysterical = hysteric | هیستریایی، هەرشتێك پەیوەندی بە هستریایەوە هەبێت. |
| مسق | Thistle | دڕك، ستری. |
| مسهسة | To wistle | فیشکە، فیشکاندن، فیشکەفیشك. |
| مسهس - بعوض صغير سكيت | Small midges = gnats | مێشوولەی ورد-خاکە. |
| مسيس | | فیشكو هۆڕ، سیپە، سیپە سیپ. |
| مسيس - كلام خفي | Whisper | چرپە-قسەی نهێنی. |
| مش - قصف | Fragile = brittle | تورت، خاو، ریزالۆك، فشەڵ، فشۆك. |
| مش - سريع الكسر | Frail = soft | ناسك، نەرم. |
| مشاشة - مشوشة | Cheerfulness | |
| مشاشة - قصافة | Fragility = brittleness smashing breaking in pieces | مادەیەك زوو وردو خاش بێت تورتی رەوشتی زوو وردو خاش بوون لە مادەدا. |
| مشم - تهشيم | Smashing = breaking- in pieces | شکاندن،-ووردوخاش کردن. |
| مشوش العظام | Brittleness of bone | ئێسك نەرمی، جۆرە نەخۆشی‌یەکە. |
| مشيم | Dryplant = Chaff = hay | گیای ووشك، پووشوو، وردوخاش، پووشو پەڵاش ، قرش، قرشك پەڕك، دارك، ریسی، ترك. |
| مضمون | Peptone | پیپتۆن، مادەی پرۆتینی هەرسکراو. |
| مضمين | Pepsin | پیپسین،هەوێنێکە لە شلاوی گەدەدا بۆ گۆڕینی مادە پرۆتینی‌یەکان. |
| مضوم | Digestable | شیاو بۆ هەرس. |
| مضيم | Digested | هەرس کراو. |
| مطل - ذئب | Wolf | گورگ. |
| مفاف - براق | Flickering | بریسکەدار. |
| مصر | To break = fracture | تێکشکاندن، شکاندن. |
| مصور | Lion | شێر. |

| | | |
|---|---|---|
| مضبة | Plateau = table land = Knoll = mound = Isolated hill | قۆپی، قەلاچ، بان، میشی، بانوو، زەوییەك هەتا رادەیەك بەرزبێت سەرەكەی تەخت بێت. |
| مضبة صغيرة | Small plateau | تەپە، تەپۆلكە، تەپۆلە. |
| مضبة كبيرة | Big plaleau | گرد، قەلات، زووزان، بانوو، بان. زەوییەكی بەرز كە سەرەكەی تەخت بێت. |
| مضبة حادة القمة | Hog back | قۆپی لووتكە تیژ. |
| مضبة جرداء | Plantless Plateau | كرال، قۆپییەكی وشكەو بێ رووەك. |
| هضم | Digesting = digestion | ١) هەرس، هەرس كردن، گوارایی، گواراكردن.<br>٢) سازاندنی هەندێك مادە بەمادەی كیمیاییتر سا بە گەرم كردن بێت یان گەرم كردنو پەستان |
| هضمي | Digestive | هەرشتێك پەیوندی بە هەرسەوە هەبێت. |
| هطل - هطول | Continuous rainfull | باران بارین بە لێزمە، داكردنی باران. |
| هف - خفيف | Light | سووك. |
| هفتان - جائع | Hungry | برسی. |
| هفهف - بارد | Cool = breezy | سارد. |
| هفهاف - رقيق - شفاف | Diapha nous | تەنكو رۆشن. |
| هفهاف - نحيف القوام | Slim = Slender | باریك- پەلە باریكە. |
| هفو - هفوان - يصفق بجناحية | To flutter | شەقەی بال. |
| هفوة - زلة | Lapse = slip = fault = error | هەلە، ساتمەكردن. |
| هفيف | To whizz | ووژە، ووژە ووژ، وەكوو ووژە ووژی با. |
| هكتار | Hectare | هێكتار، دە هەزار مەتری چوارگۆشە.-١٠ دونم-١٠٠ ئار،دونم- هەزار مەتر چوارگۆشە-١/١٠ هێكتار. |
| هكتومتر | Hectometer | هیكتۆمەتر- سەد مەتر- دە دێكامەتر. |
| هكتولتر | Hectoliter | هیكتۆلیتر- سەد لیتر-(٢٢) گالۆن. |
| هيكتوغرام | Hectogram | هیكتۆگرام- سەد گرام. |
| هكس | Hoccos | (هۆكۆس) بالندەیەكە لە پۆر ئەچێت دەنووكی ئەستوورە پارچە گۆشتێكی بە سەرەوەیە، سەری پەر دارە، كلكی درێژە، رەنگەكەی مەیلەو قاوەیی یە سكی سپی یە لەناو پێشەلاندا دەژی. |
| هلالية، تبلدي، باوباب افريقي | Cala bash tree | داركولەكە، رووەكی كولەكەی رازاندنەوە. |
| هلاميات - رخويات | Molluscan | نەرمۆلەكان، گیاندارە نەرمۆلەكان وەكو شەیتانۆكە و گوێچكەماسی. |
| هل | To appear = come out | هەلاتن، هەلهاتن، دەركەوتن. |
| هلاس سمعي | Acoasm | گوێ زرنگانەوە: بیستنی دەنگێك لە راستیدا نەبێت وەكوو زرنگانەوەی زەنگو حیلاندنی ئەسپ. |
| هلاس السمع - طنين الأذن | Acoasma | گوێ زرنگانەوە، وزە وزی گوێ.. |
| هلال - غرة القمر - قمر أوائل الشهر | Crescent = New moon = The moon in her = First quarter | مانگی یەك شەوە ، نوێ هەیڤ، هەیڤ، داسی مانگ، مانگی نوێ، مانگیلە. |
| هلالية | Heterotoma | دەومێنێكی رازاندنەوەیە، گولەكەی گەورەیە زەرد یان سوورە لەشێوەی كەوانەدایە. |
| هلالي - قمري | Lunar | مانگی، كەوانەیی. |

| | | |
|---|---|---|
| هلاك - هلك | Perdition = ruin = entire loss | فەوتان، لەناوچوون. |
| هلالان | Paren the ses = | دوو کەوانە: ئەوانەی ووشەیان تێ دەخرێت، واتە (   ). |
| هلام، جيلاتين - بلوظة | Gelatine = jelly | دەلەمە، لیـق، جـەلاتین، ولوڵـە، هێلـم، مادەیـەکی لینجـە لـە شـانە ریشاڵی‌یەکانی لەشی گیاندار(پێست و ئێسقان) دەر ئەهێنرێت. |
| هلامي | Gelatinous, jelly like | جەلاتینی= شێوە جەلاتینی. |
| هلام البحر - مدوزة - رئة البحر | medusa | چرای دەریا، سی دەریا، بەزی دەریا، ولوڵەی دەریا، گەزندەی دەریا، جۆرە گیاندارێکی دەریایی نەرمی لینجە. |
| هلام ملكي - عسل ملكي | Royal Jelly | ولوڵەی شایانە، خۆراکی شایانە. |
| هلـب - هلبـة - شعرة شوكية | Silken hair = Coars-hair bristles | •تووکی درێژ، موو، تووك، پرزوڵ، برژانگ، وەکوو تووکی کلکی ولاخ، تووکی ئەستوور و رەق. |
| هلب - مرساة السفينة | Anchor | لەنگەری پاپۆر. |
| هلبة - تحت السرة | Under navel | ژێر ناووك، ئەو بەشەی سك ئەکەوێتە ژێر ناووکەوە. |
| هلبرت | Hell-port | (هیلیپۆرت)-فڕۆکەخانەی هیلیکۆپتەر. |
| هلبندر | Hellbender | هەلبـەندەر، قورناویلکەیـەکی ( سمنـدل) ئـاویی کەتەیـە، درێژیی‌یەکـەی نزیکەی (٢٤) ئینج دەبێت. |
| هلبوت | Halibut | (هالیبوت) جۆرە ماسی‌یەکی گەورەی پانکەلەیە. |
| هلتي،لسان العصفور | Holarrhena | زمانـە چۆلەکـە، دەوەنێکـی پزیشـکی‌یە لـە کۆمەڵـەی ژاڵـە دەرمـانی لـێ دەردەهێنرێت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی ریخۆڵە. |
| هلج، هليلج، بلج الصحراء - زكون | Egyptian balsam = Thorn tree = Zachum oil tree | هەلیلە، جۆرە درەختێکی ناوچە گەرمەکانە دەوەنێکی درکاوی‌یە، بەرەکەی لە زەیتون ئەچێت تفت و تاڵە بە نەکەییوی ئەگەر بخورێت دەبێتە هۆی سك چوون. بـەڵام بـە گـەییوی شـیرینە ئـەخورێت، بەرەکـەی رۆنـی لـێ دەردەهێنرێت بۆ خواردەمەنی. |
| هلجنة | Halogenate = haloge nation | (هەلجاندن)، هالۆجین کردن، ئەوەیە کە توخمێك لە کۆمەڵەی هالۆجینەکان بخرێتە پێکهاتنی مادەیەکی ترەوە. |
| هلل - فزع - خوف | Fright, fear | ترس |
| هلج - هلس - كلام فارغ | Nonsense | قسەی پڕوپووچ. |
| هلع - فزع | Constern-nation = dismy | ترسێکی زۆر، سام. |
| هلع - هلوع | Impatient = restless | ترساو. |
| هلقس | Velvet = meadow-grass | مەخمەل، گیایەکی دەشتەکی‌یە لە کۆمەڵەی دەغڵودان بۆ لەوەڕ باشە، گوڵەکەی توکنە. |
| هلكة - تهلكة - خطر | Peril = jeopardy | مەترسی، تەملوکە. |
| هلم، حكاك | Acariose | (ئەکاریۆس) نەخۆشی‌یەکی پێستە. |
| هلموش | Black raisins | کشمیشی رەش. |
| هلهولة - خرقة | Anoldrag = tatter | پەڕۆ، پەڕۆ کۆن. |
| هلهل - كسفة ثلجية | snow flake | بەفر. توێژاڵی بەفر. |
| هلهل، الأكونيت الهلهل، هلاهل | Indian aconite = Aconitum jerox | هەلایل، جۆرێکە لە رووەکی ئەکونیت، زۆر ژەهرە گوڵێکی مۆری جوانـی هەیە. |
| هلوف - عظيم اللحية | Large bearded | ریش درێژ. |

| | | |
|---|---|---|
| هلوف | Pig = wild boar | مالوس، بەراز، بەرازە کێوی، دوو کەلبەی هەیە. |
| هلوف - حلوف | Wild boar = wild hog | بەرازە کێوی. |
| هلوك، عاهرة | Adultress | ئافرەتی خراپ، قەحپە،سۆزانی. |
| هلوسة - هذاء - هترة - تصور كاذب - توهم - تخيلات | Alusia, halluciniation | وڕێنە، شتێك بە بیری کەسێکدا بێت ئەو شتە لە راستیدا نەبێت. |
| هلوسة - هذيان | Delirium = raving | بۆ نموونە مەی خۆرێکی بەردەوام وا تەسەور بکات کە شەیتانی سوور هێرشی دەکەنە سەر، یان یەکێکی تر وای بە خەیاڵدا دێت کە کۆمەڵێك مار هێرش دەکەنە سەری یان کۆمەڵێکی گەورە مێشوولە پێوەی دەدەن. |
| هليم - لاصق | Viscous = adhesive | هێلم، لکێنەر، زەمق. |
| هليب - اربعينية الشتاء | Depth of winter | چلەی زستان. |
| هليوسكوب | Helioscope | (هیلیوسکوب) جۆرە دووربینێکە شوشەیەکی رەش یاخود رەنگاو رەنگی تیایە بۆ سەیرکردنی خۆر. |
| هليوكوبتر - حوامة - طائرة عمودية | Helicopter | (هلیلیوکۆپتەر)، فرۆکەی دیرمگی، جۆرە فرۆکەیەکە پەروانەکەی وا بە سەرییەوە بە قیتی ئەنیشێتەوە، لەهەر شوێنێکی تەختانیدا. |
| هليون - هليون - ضغبوس - كشك الماظ - كشك الماس | Asparagus | گیا مارانە، چاومار (مارچێوە)، رووەکێکی تەمەن درێژە، رەگو قەدەکەی لەژێر زەویدا بلاو ئەبێتەوە، بەرێکی سوور ئەگرێت، قەدەکەی بە کوڵاوی ئەخورێت لە کۆمەڵەی سێوی بن ئەرزە، هەندێك جۆریشی بۆ رازاندنەوە بەکاردێت. |
| هليون،صغبوص - يرامع | Sparrow grass | رووەکێکی دەشتەکی و کشتوکاڵییە، لە کۆمەڵەی زەمق ، گەلێك جۆری هەیە قەدەکەی یان قیتە یان خۆ هەڵواسەرە، گوڵەکەی سەوزو لاوازە، بەرەکەی لە دەنکی ترێ ئەچێت، رەشە یان سوورە. |
| هليلج - اهليلج | Myrobalan = myrobolan | مایرۆبالان، رووەکێکە بەرەکەی بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |
| هليون ريشي | Asparrus fern, Feathar Asparagus | مارچێوەی پەڕیی جۆرێکە لە مارچێوە، هەمیشە سەوزە، قەدەکەی درکاوییە گەڵاکەی لەبەر ئەچێت، ئەستورترە لە ئینجانەدا ئەروێنرێت بۆ مەبەستی رازاندنەوە. |
| هليونين | Asparagine | هەلیونین(ئەسپراجین) مادەیەکی نیمچە قلیەییە. |
| هليكون | Helicon | (هیلیکۆن)، ئامرازێکی مۆزیقەیە. |
| هليكونيا، وشيج | Bastard-plantain = Heliconia | رووەکێکە لە کۆمەڵەی مۆز، گوڵەکەی زەردە. |
| هليم، ظبي أزرق | Cephalophus | ئاسکە شینە، ئاسکێکی مەیلەو شینی بچووکی سووکەڵەیە. |
| هليوغراف | Heliograph | (هیلیۆگراف) تەلیسکۆبێکە بۆ وێنەگرتنی خۆر. |
| هليومتر - مجرام | Heliometer | (هیلیومەتر)، تەلیسکۆبێکە ئامادەکراوە بۆ پێوانی تیرەی خۆرو ئەستێرەکان. |
| هليوستات | Heliostat | (هیلیوستات)، ئامرازێکە ئاوێنەیەکی هەیە بۆ رەت کردنەوەی تیشکی خۆر بەیەك رێڕەودا بەیەك ئاراستەدا. |
| هليوتروب،رقيب الشمس، اكسرار، حشيشة الجروح | Cherry pie = Heliotrope | هیلیۆترۆپ، گیایەکە یان دەوەنێکە گوڵەکەی لەگەڵ خۆردا دەسووڕێتەوە، گوڵەکەی شین یان لەیلاقی و بۆن خۆشە رونێکی نایابی لێ دەردەهێنرێت، گەڵاکەی بۆ چارەکردنی ئاووسان و برین باشە. |
| همام - شجاع، جريء | Brave, bold | ئازا. |
| هم | Sorrow = worry | خەم، خەفەت، پەروا، کەسەر. |

| | | |
|---|---|---|
| همة - عزم | Resolutoin, willpower | هیمەت. |
| همبرگر | Hamburger | هەمبەرگەر، جۆرێکە لە سەندویچ، گۆشتی رانی، سورەوەکراوی تێ دەخرێت. |
| همجة | Gnats = smallfly | مێشی بچووك. |
| همجة - دروسوفيلا | Drosophila | درۆسۆفیلا، مێشێکی بچووکە. |
| همجية - وحشية | Savagery | دڕندەیی، دڕندەیەتی. |
| همجي | Savage | دڕندانە، بە شێوەیەکی دڕندە. |
| همدة | Dieback | ١) لەکارکەوتنی ئەندامی لەش.<br>٢) نەخۆشی‌یەکە ئەدات لە داری مێو زۆر زوو وشکی ئەکات. |
| همر | To pour out | ڕشتن. |
| همرة من المطر - هتن | Down pour = heavy shower | لێزمەی باران |
| همز | Spurring . | ئاوزەنگی لێدان. |
| همزة - هماز - مغتاب | Back biter | غەیبەتکەر، ئەو کەسەی لە پاشملە باسی خەڵك دەکات. |
| همس | Whispering | چپە چپ، سرپە، سرپاندن، چرپاندن، سوورسە، چرپە چرپ،وورتە، پسکە پسك. |
| همع | To shed tears | هاتنە خوارەوەی فرمێسك. |
| هـ.م.ق.ك | A C T H | هێ ، میم، قاف، کاف، هۆرمۆنێکە لە لایەن لووی نخامی‌یەوە دەردەدرێت، توێکڵی ئەدرینالین هان دەدات بۆ دەردانی کۆرتیزۆن. |
| همك - انهماك | Engross | خەریك بوون. |
| هماء - سرير معلق | HammocK | جۆلانەی هەڵواسراو. |
| هملج الحصان - ترهون - هملاج - رهوان | To amble | بەشێنەیی ڕۆیشتن(وەکوو لە ئەسپدا) ئەسپێك بە شێنەیی بڕوات. |
| همهمة | To growl = Hum = murmur | سرپە، سرپە سرپ، چرپە، چرپە چرپ، بۆڵە بۆڵ. |
| همود - سكون | Calm = subsidence | دامردنەوە، دامرکانەوە قەمراندن. |
| همود - خمود | Quiescence = Lull | دامرکانەوە، کوژانەوە. |
| همود - اكتئاب | Depression | خەمۆکی، چالاکی دەروونی نزم دەبێتەوەو ئەو کەسە لە نائومێدی‌و هەست کردن بەپەك کەوتن دەکات.. |
| هناف - مهانفة - ضحكة صفراوية. | Sardonic(or) bitterlaugh | پێکەنینێکی زەرد،پێکەنینی بوغزاوی. |
| هناء | Peduncle | لاسکی میوە. |
| هناء - سرور | Pleasure | خۆش. |
| هناء، قطران | tar | قەتران. |
| هنبر | Anon | جاشەکەر |
| هنبر، الطائر المحاكي | Mocking bird | باڵندەیەکە لە کۆمەڵەی پەپوسلێمانکە، دەنووکی درێژو چەماوەیە بۆ خوارەوە، باڵی کورتە، ڕەنگەکەی شینە مێڵی ئەرخەوانی‌و سەوزی تیایە دەنووك‌و قاچی سورە، توانای لاسایی‌کردنەوەی دەنگی باڵندەکانی تری هەیە. |
| هنداز - قياس | Measure | پێوانە-ئەندازە. |

| | | |
|---|---|---|
| هندازة | Ell | ئەندازە،گەز،باڵ، پێوانەیەکە بۆ قوماش، |
| هنبوع | Truffle | جۆرێکە لە دوومەڵان. |
| هندسة عملية | Engineering = geometry | ئەندازە، ئەندازیاری. |
| هندسة مستوية = هندسة السطوح | Plane geometry | ئەندازیاری، تەختایی، ئەندازیاری رێکی. |
| هندسة مجسمة | | ئەندازیاری تەنداری، ئەندازەی تەنداری. |
| هندسة تحليلية | Analytical geometry | ئەندازیاری شیکردنەوە، ئەندازەی شیکردنەوە. |
| هندسة فراغية = هندسة حيزية | Solid geometry | ئەندازەی بۆشایی. |
| هندسة ري | Irrigation engineering | ئەندازەی ئاودێری. |
| هندسة معمارية | Architecture | ئەندازەی تەلارسازیی. |
| هندسة وصفية | Descriptive | ئەندازەی وەسف کردن(باس کردن). |
| هندسة معمارية - ريازة | Engineering architecture | ئەندازیاری ساختمان، ئەندازەی خانووکردن. |
| هندسة مدنية | Civil engineering | ئەندازیاری شارستانێتی، ئەندازەی ساختمان. |
| هندسة الكترونية | Electronic engineering | ئەندازیاری ئەلەکترۆنی. |
| هندي شعري - اهليج هندي | Myrobalan blacK | هەلیلەی هیندی. |
| هندام - هندمة - حسن القد. | Trim = well shaped | شێوە جوانی. |
| هندسة زراعية - زردقة | Agronomy = agricu ltural engineering | ئەندازیاری کشتوکاڵی. |
| هندسة كيمياوية | Chemical ergineering | ئەندازەی کیمیایی، لقێکە لە زانستی ئەندازە، پەیوەندی هەیە بە بەرهەمهێنانی بڕی زۆر لە کەلوپەلەوە بە کرداری کیمیایی لە کارگەکاندا. |
| هندسة كهربائية | Electrical engineering | ئەندازیاری کارەبایی، ئەندازەی کارەبایی. |
| هندسة ميكانيكية | Mechanical geometry | ئەندازیاری میکانیکی، ئەندازەی میکانیکی. |
| هندسي | Geometrical | ئەندازیاری، ئەندازەیی، هەرشتێك پەیوەندی بە ئەندازەوە هەبێت. |
| هندرويت - كنتال انگليزي | Hundred weight | هەندرویت، یەکەیەکی کێشەیە دەکاتە (٥٠/٨) کغم لە ئینگلتەرەو لە ئەمریکا ٤٥/٣٦ کغم. |
| هندي | Indus (The Indian) | هیندی، کۆمەڵە ئەستێرەیەکی باشوورییە. |
| هندب، طرخشقون - هندباء | Dandelion = Bluw ball = Canker wort | کاسنی، گیایەکی دەشتەکی و تەمەن درێژو زیان بەخشە بە کشتوکاڵ،هەندێك جۆری کشتوکاڵی هەیە، گەڵاکەی ئەخورێت. |
| هندباء برية - خس بري | Dande lion | تالیشك. |
| هندباء - هند باء - بقلة مباركة،شيكوريا. | Endive = chicory = Succory | کاسنی، گیایەکی کشتوکاڵییە گەڵاکەی چرچە یان لە گەڵای کاهوو ئەچێت گوڵەکەی شینە بۆ خواردن بەکاردێت. |
| هندباء برية، خس بري، هندباء مرة - طرخشقون | Dande lion = Taraxacum | تاڵیشك، تاڵك، تاڵکە، رووەکێکی گیایی تەمەن درێژو گەڵاکەی ددانداره، گەلێك جۆری هەیە، هەندێکی لە پزیشکیدا بۆ دەرمانی رەوان کردن بەکاردێت، وە لە رەگی هەندێکی مادەی کاوتشۆك دەرئەهێنرێت. |
| هنري | Henry | هەنری- یەکەی هاندای کارەبای دەکاتە($١٠^{٩}$ یەکەی کارو موگناتیسی). |

| | | |
|---|---|---|
| منعة، ميسان | Alhena | ئەلهينا، ناوى ئەستێرەيەكە بە عەرەبى. |
| منك، ترديد، صدى | Echo | زايەڵە، هەنگ وانەوە. |
| منيهة، وقت قصير | A little while | كاتێكى كەم. |
| منيّة، خيطية، فتيلة حبيبية | Mitochondria | مايتۆكۆندريا، دەنكۆڵەيەكى دەزوولەيى‌يە ناوەندێكە بۆ پێكهێنانى ووزە لە خانەدا. |
| منقب، قزم | Dwarf = Pigmy | گرگن،سيخن،كورتەبنە، بنەمۆم،گدۆل. |
| منكرة، كثرة العمل والحركة | Fuss | زۆرى ئيش و جوولە. |
| منم، تمر | Dried-dates | خورماى ووشك (ووشك كراوە). |
| منهونة، تهميمة، تهويدة | cradle song | لايلايە (كە بۆ مندال دەكرێت بۆ خەواندنى). |
| هواء | Air | هەوا، تێكەڵاوێكى بێ رەنگ لەچەند گازێك وەكوو ئۆكسجين و نايترۆجين و دووەم ئۆكسـيدى كـاربۆن پێكـهاتووە،دەورووپشـتى خرۆكـى زەوى داوە، زيندەوەر هەناسەى پێ ئەدات و يارمەتى سوتان ئەدات. |
| هواء ميت | Dead air | هەواى مردوو، ئەو هەوايەى كە ئۆكسجينى تيادا نيەو رێژەيەكى زۆرى لە دووەم ئۆكسيدى كاربۆن تيادايە بە كەڵكى هەناسەدان نايەت وەكوو هەواى ناو كانەكان. |
| هوائي | Aerobic | ئەو گياندارە ميكرۆسكۆبى‌يانەى كە ناتوانن بەبێ هەوا بژين. |
| هوائي | Antena | هەوايى، ئامرازێكە شەپۆلى لاسلكى دەمژێت. |
| هوائي | Aerial | هەوايى، پەيوەندى بە هەواوە هەبێت. |
| هواء مطلق | Absolute air | هەواى پاك، هەواى بەرەڵلا.. |
| هواء مسال | liquid air | هەواى شل. هەوا پەستانێكى زۆرى دەخرێتە سەر ئنجا شل دەكرێتەوە. |
| هواء اصفر | Cholera | كۆلێرا، رەشە رشانەوە، زەردە هەوا، چاوەقوڵى. |
| هوام | | جرووجانەوەر، دەعبا، گياندارى خشۆك، گياندارى زيان بەخش، مارومێروو. |
| هواية | Hobby | خوليا، مەراق، خوو، هەر كارێك مرۆڤ، لە كاتى بەتاڵيدا پێى هەستێت وەكوو كۆكردنەوەى پوول. |
| هوابط - حليمات عليا | Stalactite | ئاوێتەيـەكى كيميـايى نيشـتووى قسـڵيە وەكـوو چلـووره لـە بنميچـى ئەشكەوتەكانەوە پەيدا ئەبێت و شۆڕئەبێتەوە بۆ خوارەوەو ديمەنێكى جوان ئەدات. |
| هوتة - ارض منخفضة | Depressed land = pit | شوێنێكى نزمايى. |
| هوبر | Cheetah | يۆز، وێز، گياندارێكە لە پڵنگ ئەچێت. |
| هوبر | Rhinopithecus | جۆرە مەيمونێكە لە ولاتى تيبت ئەژى دەمو چاوى سەوزى مەيلەو زەردە پيستەكەى مەيلەو زەردە تووكێكى پێوەيە لە مەرمز ئەچێت. |
| هوة | abyss = bottom less pit | كەندەلان، كەنەلان. |
| هوتزن | Hoatzin | هۆتزن، باڵندەيەكى سەيرە لە سيسرك ئەچێت سـەرەكەى پـەرێكى زۆرى پێوەيـە وەكـوو شـاخ بـەرز بوونەتـەوە، باڵـەكانى چرنووكيـان پێوەيـە بـۆ هەڵگەران بەسەر لقى درەختدا، لەناو دارستانە زەلكاوى‌يەكاندا لە باكوورى ئەمريكاى باشووريدا دەژى. |
| هوجاء - ريح دوامة | Cyclone | گەردەلوول. |
| هودج | Sedam = dowdah | كەژاوە، كەچاوە، تەختەرەوان. |
| هودج الحمال | Camel litter | كەژاوەى وشتر (واتە لەسەر پشتى وشتر) |
| هودع | Camel | وشتر. |

| | | |
|---|---|---|
| هودوسكوب | Hodoscope | (هـۆدۆ سـکۆپ) دەزگایەکـە ڕێبـازی تەنۆکـەی بارگـەکراو پیشـان دەدات، بەهۆی ژمێرەری ئایۆنی‌یەوە. |
| هوذة | Surnia Funerea | ١) کوڕ کوڕە، جۆرە باڵندەیەکە.<br>٢) جۆرێکە لە کوندەبەبوو، ڕەنگەکەی سپی‌یە، سەری بێ پەڕە. |
| هوذل | Small monKey = young of monKey | بەچکە مەیمون. |
| هور | Lagoon | دەریاچەیەکی فراوان. |
| هور | Natural Pond -Natural Pool = fen | زەلکاو، زونگاو. |
| هورة | Sand box = possum wood | درەختێکی دەشتەکی ناوچە گەرمەکانە، بەرەکەی لە چەند کوژێکـی دوو لەتکـەیی پێکـهاتووە کـە تۆویـەکی ژەهـری تیادایـە کـاتێک کـە بەرەکـەی پێدەگـات شـەق ئـەبات و دەنگێکی لێوە دێـت لـە ئـاوکی قـەدو کاکڵـەی بەرەکەی مادەیەکی ژەهر دەردەهێنرێت. |
| هورسكوب | Horoscope | پەرەی ڕادار. |
| هورنبلند | Homblende | (هۆرنبلند) بریتی‌یە لە سلیکاتی مەگنیسیۆم و کالسیۆم و ئاسن و کەمێک لە ئەلەمنیۆمی تیادایە، بەشێوەی کریستاڵی سەوزی مەیلەو ڕەش لە بەردە ئاگرینەکاندا هەیە. |
| هورنفلس - صخور قرنية | HornFels | هۆرنفێلس، کەڤرێکی دەنکۆڵە وردە. |
| هورست | Horst | هورست ، بەرزایی‌یەکی زەوی کەوتبێتە نێوانی دوو نشێوی‌یەوە. |
| هورة - تهلكة | Danger | مەترسی. |
| هورنبلند | Homblende | هۆرنبلێند کانزایەکە بریتی‌یە لە سلیکاتی ئاسن و مەگنیسیۆم و کالسیۆم و ئەلەمنیۆم و سۆدیۆمی ئاوی بەشێوەی بلووری سەوزی مەیلەو ڕەش هەیە. |
| هوزن | Kelopa | (کیلۆپا) جۆرێکە لە کوندەبـەبوو گەورەیـە ڕەنگەکـەی خۆڵەمێشی هێڵـی ڕەشی تیایە. |
| هوس | mania | خولیا، هۆگری‌یەکی زۆر (پاشگرێکە). |
| هوس الأفيون | Opiomania | خولیای تلیاک، خولیای تلیاک کێشان. |
| هوس الأكل، شهية | Orexi mania, appetite | خولیای خواردن. |
| هوس المرض | Nosomania | خولیای نەخۆش. |
| هوس التعري | Nudomania | خولیای خۆ ڕووتکردنەوە. |
| هوس الموسيقي | Musicomania | خولیای مۆسیقا. |
| هوس العظمة، جنون العظمة | Megalomania | خولیای مەزنی، خولیای گەورەیی، خولیای خۆ بەزل زانین. |
| هوس الشراب | Dipsomania | خولیای مەی خواردنەوە. |
| هوس السرقة | Kleptomania | خولیای دزیکردن، جۆرێکە لە پشێوی ژیریی ئەو کەسە ئارەزوویـەکی زۆری دەبێت بۆ دزیکردن. |
| هوشيرا | Heuchera = coral bells = crimson bells | زەنگۆڵەی شیلانی، گیایەکی دەشتەکی‌یە گەڵاکەی بەشێوەی هێشووی بچووکە، مەیلەو سەوز یان سپی‌یە یان سوورە. گوڵی بچووکی شێوە شیلانی (مەرجانی) دەگرێت. |
| هوشة - اضطراب | Agitation | پشێویی. |
| هوفينية | Hovenia = Japanese raisin tree | هوفینیا، درەختێکە لە کۆمەڵەی ئاوک (نبق) ، بەرەکـەی سـوورو شـیرینە تـامی مێوژ ئـەدات ئـەخورێت، لـە بەرەکـەی و گەڵاکـەی عـەترێکی بـاش دەردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| هولوسين العصر الحديث | Holocene = recent | (هۆلۆسین) سەردەمی تازە لە چاخی چوارەمی دێرینی ژیانی نوێ. |
| هوموسابينز | Homosapiens | هۆمۆساپینز، (هۆمو) بەمانای مرۆڤ و (ساپینز) بەمانی ژیر واتە مرۆڤی ژیرکە مێشکی گەورەی هەیەو دەتوانێت بە قیتی بڕوات و دەستی بەکار بهێنێت. |
| هومس،دبال - محلول عضوي | Humus | پەیین، مادەیەکی قاوەیی یان رەشە لە ئەنجامی شی بوونەوە مادەی ئەندامی وەکوو زبل و رووەکی مردوو لە زەوییدا بە کاری ئاوە گەرمی و ئۆکسجین و باکتریا پەیدا دەبێت. |
| هوفية | Hovia | (هۆڤیا) دەوەنێکە |
| هوكي - هكي جحفة | Hocky | هۆکی، جۆرە یارییەکە. |
| هولميوم | Holmium | (هۆلمیۆم) توخمێکی کیمیایی کانزایە کێشی ئەتۆمییەکەی (١٦٤/٩)و ژمارەی ئەتۆمییەکەی (٦٧) ناوەکەی لە وشەی (هۆلمیا) واتە شاری ستۆکهۆلم وەرگیراوە، وە نیشانەکەی (Ho). |
| هول، إرهاب | Terror = Fright | ترسێکی زۆر، تۆقین، بزداندن. |
| هولة - شيء مفزع | Monster = Frightful | ترسناك. |
| هولية - فراشة هولية | Horn blowers = Horn worm | پەپوولەیەکی گەنم رەنگی باڵ چوڵەکەییە مێتولکەکەی زیان بە رووەك ئەگەیەنێت. |
| هولتريش | | هۆلتریش، قالۆنچەیەکی ژەهرینە. |
| هولوغرافي - سند خطي | Holograph | دەست نووس، ناسنامە، بڕوانامەی دەست نووس. |
| هوية - بطاقة شخصية | Identitiy card | ناسنامە. |
| هويد - تنوط - طير حائك | Weaver bird | باڵندەیەکی كلك درێژە، هێلانەکەی ئەچنێت. |
| هوى - حب | Love = affection = passion | خۆشەویستی، دڵداری، شەیدایی، ڤیان، بارێکی دەروونی قووڵ و بەردەوامە بەرامبەر کەسێك یان شتێك. |
| هوينا - تودة - رفق | Gentleness | شێنەیی، ئەسپایی. |
| هويا - هوية - زهرة الشمع | Hoya = fleshyf leaved = wax flower plant = wax plant = Hoya car nosa | (هۆیا) (گوڵەمۆم)، دەوەنێکی خۆهەڵواسەری ڕازاندنەوەیە گوڵێکی بچووکی سپی مەیلەو زەردی مۆمی هەیە بازنەیەکی سووری تیایە. |
| هوية | Identity | ناسنامە. |
| هيئة - شكل، لجنة | Aspect = Form, board, committee | ١)شێوە، نیگا، دیمەن، ڕواڵەت.<br>٢) دەستە، لیژنە، کۆمەڵە. |
| هيئة تشريعية | Legislative = Legislature | دەستەی یاسادانان، ئەنجوومەنی یاسادانان. |
| هيئة - جماعة منتظمة | Organisation, association | کۆمەڵە، کۆمەڵێکی ڕێکخراو. |
| هيئة الأمم المتحدة | United Nations = organisation U.N.O | کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان. |
| هيئة المحكمة | The court | دادگا، دەستەی دادوەران. |
| هياب، جبان | Frightened, coward | ترساو، ترسنۆك. |
| هياكنيت | Hyakinth | هیاکنیث، بەردێکی بە نرخە لە زیرکۆن پێکهاتووە. |
| هياج - توران - اضطراب | Disturbance | خرۆش، خرۆشان، وورووژان، پشێوی. |
| هياج جنسي | Sex vality | حەشەرێتی، ئاڵۆشی رەگەزی. |
| هيام - عشق شديد، رغبة | Inordinate, Love, eager, desire | شەیدایی |

| | | |
|---|---|---|
| هياسنث | Hyacinth | ڕووەکێکی بۆنخۆشە. |
| هياليت | Hyalite | هیالایت، بەردێکی بەنرخی شووشەیی ڕۆشنە. |
| هيار صخري | Eaving-in | هەرەس هێنانی کەڤریی هەرەسی کەڤری وردو خاش بوونی کەڤری شکاوە. |
| هيار ثلجي - جراف ثلجي | Avalanche | هەرەس هێنانی بەفریی، تۆپەڵێکی گەورەی بەفر لە چیا بەرزەکان جیا دەبێتەوەو بەرەو شیوو دۆڵەکان دەڕوات، جاری وا هەیە یەك دوو گوند دەکات بەژێرەوە. |
| هيب - عتلة | Crow bar | نویل، بۆ بەرزکردنەوەی شتومەك. |
| هيبورات | Hippurate | هیپۆرات، خوێی میزی وڵاخ ، لە ئەنجامی کارلێکی نێوان ترشی هیپوریك و یەکێك لە مادە تفتەکان وەکوو هایدرۆکسیدی کالسیوم یان سۆدیوم پەیدا دەبێت، ترشی هیپوریك لە میزی وڵاخدا هەیە. |
| هيبو | Hypo-, Hyp- | هایپۆ، ژێر، کەمتر لە باری ئاسایی. |
| هيبوفسفات | Hypophosphate | هایپۆفۆسفات ، مادەیەکی کیمیاییە. |
| هيبوفسفيت | Hypophosphite | هایپۆفۆسفیت ، مادەیەکی کیمیاییە. |
| هيبوزنثين | Hypoxanthine | هایپۆزانثین ، مادەیەکی کیمیاییە. |
| هيبوسلفيت | Hyposulfite | هایپۆسولفایت ، مادەیەکی کیمیاییە. |
| هيبسوغرافيا | Hypsography | هایپسۆگرافی، زانستی پێوانی بەرزاییەکانی سەر زەوی و دانانی نەخشە بۆیان. |
| هيبسومتر | Hypsometer | هایپسۆمیتەر، پێوەری بەرزایی. |
| هيبوثالاموس | Hypo-thalamus | هایپۆثالامەس، ژێر لانکەی بینایی لە مێشکدا، شوێنێکە لە مێشکدا. |
| هيبوكلوريت الكالسيوم - اوكس كلوريد الكالسيوم | Calcium hypochlorite = $Ca (ocl)_2$ | هایپۆکلۆریتی کالیسیۆم، مادەیەکی بلووری بۆ لەناوبردنی کەڕوو و قەوزەو باکتریاو لابردنی بۆنی ناخۆش و لابردنی ڕەنگ(لە کاغەزو قوماشدا) بەکاردێت. |
| هيبوفوسفيت الأمونيوم | Ammonium hypophosphite | هایپۆفۆسفیتی ئامۆنیۆم ($NH_4$ $N_2$ $PO_2$) بەشێوەی بلووری بێ ڕەنگ یان تۆزی سپی هەیە، بە گەرم کردن هەڵمێکی ژەهرینی لێ پەیدا دەبێت. |
| هيبوفوسفيت الباريوم | Barium hypophosphate | هایپۆفۆسفیتی باریۆم، ($B_a$ $H_4$ $(op_4)$). |
| هيبافيت | Hepavit | (هیپاڤیت) دەرمانێکە بۆ چارەکردنی نەخۆشی جگەر بەشێوەی حەبە. |
| هيبتان | Heptane | (هێپتان) گازێکی هایدرۆکاربۆنییە لە (٧) ئەتۆم کاربۆن و (١٦) ئەتۆم هایدرۆجین پێکهاتووە. |
| هيبا فروفيت | Hepaferrovit | (هیپافیرۆڤیت) دەرمانێکە بۆ چارەکردنی خوێن کەمی. |
| هيبقون - افيقون | Hormelcumin Hypecoum | گیایەکی دەشتەکییە لە کۆمەڵەی خاش خاش گەڵاکەی مەیلەو شینە، بەرەکەی لە بەری فاسۆلیا ئەچێت، بەڵام وەکو داس چەماوەیە. |
| هيبنورال | Hypnoral | (هایپنۆراڵ)-دەرمانێکی ئارامدەرو خەوێنەرە بەشێوەی شلەیە. |
| هيبة - احترام - اعتبار، تقدير | Respect = esteem | ڕێز، ڕێزلێگرتن. |
| هيبارين - كبدين | Heparin | (هیپارین)-جگەرین، مادەیەکە لە جگەردا هەیە ناهێڵێت خوێنی لەش بمەێت هەروەها دەرمانێکە بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێت بەشێوەی دەرزی هەیە. |
| هيبوكوندريا | Hypochondria | هایپۆکۆندریا، واسواسی نەخۆشی، نەخۆشی واهیمە، ئەوەیە کە کەسێك وای بە خەیاڵدا بێت کە نەخۆشییەکی تایبەتی هەبێت، بەبێ ئەوەی ئەو نەخۆشییەی هەبێت. |
| هيدروكسيد الصوديوم - صودا كاوية | Sodium Hydroxide | هایدرۆکسیدی سۆدیۆم-سۆدەی داخکەر. |

| | | |
|---|---|---|
| هيدروكسيد البوتاسيوم | Potassum hydroxide | هایدرۆکسیدی پۆتاسیۆم-پۆتاسی داخکەر. |
| هيدروكسيد الكالسيوم | Calcium hydroxide | هایدرۆکسیدی کالسیۆم.-ئاوی قسل. |
| هيدرات | Hydrates | هایدرەیت، ئەو ئاوێتە کیمیاییانەی کە ئاویان تیادایەوەکوو زاخ. |
| هيدروكربون | Hydrocarbon | هایدروکاربۆن- ئاوێتەیەکی ئەندامییە لە کاربۆن هایدرۆجین پێکهاتووە وەکوو گازی میثانو ئەستیلین زۆربەیان وەکوو سووتەمەنی بەکار دەهێنرێت. |
| هيدروكسيد الكروم | Chromic hydroxide $Cr(OH)_3$ | هایدرۆکسیدی کرۆم، بەشێوەی نیشتوویەکی جەلاتینی سەوز هەیە، لە ئاودا ناتوێتەوە بەڵکو لە ترشیی و قلیە بەهێزەکاندا، لە ئامادەکردنی خوێیەکانی کرۆمو بۆیەدا بەکاردێت. |
| هيدروكسيد السيروز $ce(OH)_3$ هيدرات السيريوم | Cerous hydroxide = cerium hydrate | هایدرۆکسیدی سیرۆز، ئەگەر پاك بێت لە ئامادەکردنی خوێیەکانی سیریۆمدا بەکاردێت. هەروەها لە دروست کردنی شووشەو مینا، جۆرە پیسەکەش لە دروست کردنی چرای کارەباییدا بەکاردێت. |
| هيدروكسيد الكوبلت $CO (oH)_2$ | Cobalt hydroxide | هایدرۆکسیدی کوبالت، بەشێوەی تۆزێکی سووری پەمبەیی هەیە لە ئامادەکردنی خوێیەکانی کۆبالتو بۆیەو مادەی ووشك کردنەوەی وەرنیشو کارکەری یاریدەردا بەکاردێت. |
| هيدروكسيد الكادميوم $Cd(oH)_2$ | Cadmium hydroxide | هایدرۆکسیدی کادمیۆم، بەشێوەی تۆزێکی سپی هەیە، لە ئامادەکردنی خوێیەکانی کادمیۆمو رووکەشکردن بە کادمیۆمدا بەکاردێت. |
| هيدروكسيد البزموث | Bismuth hydroxide | هایدرۆکسیدی بزموث، تۆزێکی سپییە لە ئامادەکردنی خوێیەکانی بزموثدا بەکاردێت. |
| هيدروكسيد الكوبلتيك - هيدروكسيد الكوبلت $Co(oH)_3$ | Cobalt hydroxide Cobaltic hydroxide | هایدرۆکسیدی کۆبالت، بەشێوەی تۆزێکی قاوەیی تێر هەیە، بۆ ئامادەکردنی خوێیەکانی کۆبالت بەکاردێت. |
| هيدروكسيد البريليوم | Beryllium hydroxide $Be (^{o}H)_2$ | هایدرۆکسیدی بریلیوم، تۆزێکی سپییە، ژەهرینە. |
| هيدروكسيد الأمونيوم - محلول الأمونيا | Ammonium hydroxide ($NH_4$ oH) | هایدرۆکسیدی ئامۆنیۆم، گیراوەی ئامۆنیا، شلەیەکی بێ رەنگی بۆن تیژە،گیراوەکەی لە ٣٠٪ ئامۆنیای تیادایە لە دروستکردنی قوماشو رایۆنو لاستیكو پەینو دەرمانو سابونی ئامۆنیاو رۆنی مەکینەو تەقەمەنیو پارێزگاری کردنی تەختە لە سووتانو مەرەکەبو سیرامیكو سابۆنێتیو چەورییو تۆزی شتن. بەکاردەهێنرێت. |
| هيدروكسيد السيريك | Ceric hydroxide $ceo_2$ $H_2o$ | هایدرۆکسیدی سیریك، لە دروستکردنی خوێیەکانی سیریۆمو شووشەو مینا، بە تایبەتی رەنگە زەردەکەی بەکاردێت. |
| هيدروكسيد المغنيسيوم الطبيعي - بروسيت | Brucite = Natural magnesium hydroxide $Mg (oH)_2$ | (بروسایت) هایدروکسیدی مەگنیسیومی سروشتی، ئاوێتەیەکە رەنگەکەی سپی، خۆڵەمێشی ، مەیلەو سەوزە، بریسکەیەکی مرواریانەی هەیە، لە ناوچەی نیڤاداو کەنەدا هەیە، وەکوو مادەیەکی رەتکەرەوەی گەرمی بەکاردێت بە تایبەتی لە دروستکردنی دیواری کورەدا بەکاردێت. |
| هيدروكسيد | Hydroxide | هایدرۆکساید، هیدرۆکسید، رەگێکی کیمیاییە نیشانەکەی (OH) لە ئاوێتە ئەلکالییەکاندا هەیە وەکوو سۆدیۆم هایدرۆکسایدو پۆتاسیۆم هایدرۆکساید. |
| هيدروكسيد الحديديك الطبيعي | Umber, ferric hydroxiae | هایدرۆکسیدی ئاسنیکی سروشتی: دووەم ئۆکسیدی مەنگەنیزی تیادایە بریتیە لە تۆزێکی قاوەیی لە دروست کردنی بۆیەدا بەکاردێت. |

| | | |
|---|---|---|
| هيدروكســيد البــاريوم - هيدرات الباريوم - باريتا الكاوية | Barium hydroxide = barium hydrate = $Ba(oH)_2 .8H_2o$ | هایدرۆکسیدی باریۆم، هایدرایتی باریۆم، بەشێوەی تۆزێکی سپی یان بلوور هەیە، لە ئامادەکردنی ئاوێتە ئەندامی‌یەکان و خوێیەکانی باریۆم و لە کیمیای شیکردنەوەدا بەکاردێت. |
| هيدروكسيد الكالسيوم - هيدريــت الكالســيوم - جيركاو - جير مطفأ $Ca(OH)_2$ | Calcium hydroxide | هایدرۆکسیدی کالیسیوم، قسڵی کوژاوە، تۆزێکی بلووری وردی سپییە ئامەکەی تاڵە لە دروستکردنی هەوریری قوڕو قسڵی گەچکاری و چیمەنتۆو ئامادەکردنی خوێیەکانی کالسیۆم و داڕووی گەرماو(تووک لابردن) پیشەسازی پێستەو بۆیەی قسڵ و پزیشکێتی و سازکردنی ئاوو پاککردنەوەی ئاووگی (شەربەتی) شەکرو بۆیەی ئاویی و بەپیت کردنی خاک و لە پەترۆکیمیاییدا بەکاردێت. |
| هيدروكسيد السيزيوم CS (oH) | Cesium hydroxide | هایدرۆکسیدی سیزیوم، بەشێوەی تۆپەڵە بلووری بێ ڕەنگ یان مەیلەو زەرد هەیە لە پاتری کۆکردنەوەدا (بطارية الخزن) بەکاردێت. |
| هيدروكلوريد الأنيلين | Aniline hydrochloride | هایدرۆکلۆریدی ئەنیلین، بەشێوەی بلووری سپی هەیە، لە دروست کردنی بۆیەو لە چاپ کردندا بەشێوەی ئەنیلینی ڕەش بەکاردێت. |
| هيدروليكي | Hydraulic | هایدرۆلیکی، (١) هەر ئامرازێك بە ئاو بسوڕێنرێتەوە.(٢) پەیوەندی بە ئاوو شلە جووڵاوەکانەوە هەیە. |
| هيدروليات - علم السوائل المتحركة | Hydraulics | هایدرولیکس، زانستی شلە جووڵاوەکان. |
| هيدروديناميي | Hydrodynamic | هایدرۆداینەمیك، پەیوەندی بەهێزی ئاوەوە هەیە. |
| هيدريد | Hydride | هایدرید، ئاوێتەیەکە لە هایدرۆجین و توخمێکی تر پێك دێت وەکو سۆدیۆم هایدراید. |
| هيدريد الكالسيوم | Calcium hydride | هایدریدی کالسیۆم، بەشێوەی بلووری یان تۆپەڵی سپی مەیلەو خۆڵەمێش هەیە، وەکوو کارکەرێکی لێکەرەوە(عامل مختزل) و کارکەرێکی وشك کەرەوە، لە کیمیای شیکردنەوەی مادە ئەندامی‌یەکاندا بەکاردێت. |
| هيدريد البريليوم | Beryllium-hydride ($BeH_2$) | هایدریدی بریلیوم، مادەیەکی ڕەقی سپییە لە سووتەمەنی مووشەکدا بەکاردێت. |
| هيدريد الزرنيخ - ارسين | Arsenic hydride($A_sH_3$) | ئارسین، هایدرایدی زەرنیق، گازێکی بێ ڕەنگی زۆر ژەهرینە لە جەنگی کیمیاییدا بەکاردێت. |
| هيدرات الكلورال $CCl_3\ cH(oH)_2$ | Chloral hydrate | هایدراتی کلۆرال، بەشێوەی بلووری بێ ڕەنگ–ی ڕۆشنی بۆندار هەیە، کەمێك تاڵە لە دروستکردنی دەرمان و (دی،دی،تی) D.D.T دا بەکاردێت. |
| هيبة - خوف | Fear | ترس، سام. |
| هيثم - كوشياجدارية | Kochiamuricata | گیایەکی بیانی‌یە. |
| هيثم | Eaglet | بەچکەداڵ. |
| هيجان، ثوران | OutbreaK = emotion | خرۆش، خرۆشان، وروژان.شپرزەبوون. |
| هيج - تصفير | Etiolation | زەردبوونی ڕووەك بەهۆی سێبەرەوە. |
| هيدرا،عدار | Hydra | گیاندارێکی ئاوی‌یە. |
| هيدريد الأنتمون | Stibine | (ستیبین)- هایدریدی ئەنتیمۆن. |
| هيدرازين | HydraZine | (هایدرازین) ئاوێتەیەکی تفت و تاڵە. |
| هيدروجين | Hydrogen | هایدرۆجین، توخمێکی کیمیایی ئاکانزایە بەشێوەی گازێکی بێ بۆن و بێ تام و بێ ڕەنگ ئەسووتێت، سووکترین مادەی کیمیاییە لە پێکهاتنی ئاوو لەشی زیندەوەردا بەشدارە کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (١/٠٠٨) و ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (١) و نیشانەکەی (H) ماناکەی پەیداکەری ئاو ئەگرێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| هيدروكربون مشبع | Saturated Hydrocarbon | هایدرۆکاربۆنی تێر. |
| هيدروكـــبريتيد الكالسيوم | Calcium hydro sol fide, ca (Hs) $_2$ 6H$_2$o | هایدرۆ گۆگردیدی کالسیۆم، بەشێوەی بلووری بێ ڕەنگ هەیە، لە ئاوو ئەلکهولدا دەتوێتەوە، لە پیشەسازی پێستەدا بەکاردێت. |
| هيدروكورتيزون | HydrOcor tisone | هایدرۆکۆرتیزۆن مەڵحەمێکە بۆ چارەکردنی نەخۆشی پێست. |
| هيدروكينون | Hydroquinone | (هایدرۆکینۆن) ئاوێتەیەکی ئەندامییە لێکەرەوەیەکی بەهێزە لە ترش کردنی وێنەی فۆتۆگرافیدا بەکاردێت. |
| هيدروكورتوتون | Hydrocortone | (هایدرۆکۆرتۆن) کرێمێکە واتە مەڵحەمێکە بۆ چارەکردنی نەخۆشی بەکاردێت. |
| هيدروكورتيفور | Hydrocortifor | (هایدرۆکۆرتیفۆر)، جۆرێکە لە قەترەی چاو. |
| هيدروميت | Hydromet | هایدرۆمێت دەرمانێکە بۆ چارەکردنی کرژبوون (پەستان) بەکاردێت بەشێوەی حەب هەیە. |
| هيدبي | Virga | (ڤیرگا) جۆرێکە لە هەور. |
| هيدروجين ثقيل - ديوتريوم | Deuterium = heavy hydro gen | (دیوتێریوم) هایدرۆجینی قورس، بریتییە لە تێکەڵاوێك لە هایدرۆجینی(دیوتیریوم) کە دوو ئەوەندەی هایدرۆجینی ئاسایی قورسە لەگەڵ هایدرۆجینی (تریتیوم) کە سێ ئەوەندەی هایدرۆجینی ئاسایی قورسە، ئەگەر ئەم تێکەڵاوە لەگەڵ ئۆکسجین یەك بگرێت ئەتۆمی بەکاردێت وەکوو دروست کردنی بۆمبای هایدرۆجینی. |
| هيدروجين - حديث التولد | Nascent Hydrocarbon | هایدرۆجینی تازە پەیدا بوو، هایدرۆجینێکی چالاکە لە کرداری لێ کردنەوەدا. |
| هيدروكاربون | Hydrocar bon | (هایدروکاربۆن) ئاوێتەیەکی کیمیایی ئەندامی ( ئۆرگانیکی) کە تەنها لە هایدرۆجین و کاربۆن پێك هاتبێت وەکوو پرۆپان. |
| هيدروليك | Hydraulics | (هایدرۆلیك) زانیاری شلە جووڵاوەکان. |
| هيدرولوجي | Hydrology | هایدرۆلۆجی زانیاری ئاو. |
| هيدرو جيولوجي | Hydro-geology | هایدرۆجیۆلۆجی، جیۆلۆجیای ئاو، پەیوەندیی ئاو بە زەوییەوە. |
| هيدروارجيروم - زئبق | Hydroargerum | هایدرۆئەجیروم مێرکەری، هایدرۆ ئەرجیروم، جیوە. |
| هيدرومتر - مقياس مائي | Hydrometer | (هایدرۆمەتر) پێوەری کێشی جۆری شلەکان. |
| هيدريس،قضاعة | Otter = Enhydris | (ڕێوی ئاویی)،گیاندارێکی دەریایی شیردەرە لە کۆمەڵەی دەڵەك سەری خڕە تووکەکەی کورت و نەرمەو ڕەش و نایابە. |
| هيدروغرافي | Hydrography | هایدرۆگرافی زانیاری ئاوەکانی سەر ڕووی زەوی وەکوو زەریا و دەریا و ڕووبارەکان. |
| هيدروميس | Hydromys | (هایدرۆمیس) گیاندارێکی شیردەری قرتێنەرە لە کۆمەڵەی مشك لە قەراغ ئاوی ڕووبارو گۆمەکان و دەرکایان دا دەژی. |
| هيراكودون | Hyracodon | (هیراکۆدۆن)، نیمچە ئەسپ. گیاندارێکی قڕتێکەوتووە لە ئەسپ چووە. |
| هيرودين | Hirudin | هیرودین: دەرمانێکە لە زەروو(علق) دەردەهێنرێت، ناهێڵێت خوێن بمەیێت. |
| هيربليكس | Herplex | (هێرپلێکس)جۆرێکە لە قەترەی چاو. |
| هيروغليفي | Hieroglyphic | هیرۆ غلیفی، ئەو جۆرە نوسینەی کە پیاوانی ئاینی میسر شتیان پێ‌دەنووسی. |
| هيراكوثيريم - ايوهيبس | Hyracotherium = Eohippus | هیراکۆثیریەم، ئیۆهیپەس.ئەسپی سەرەتایی- یەکەم ئەسپ لە سەگی ڕاوچووە لە دەستیدا چوار پەنجەو لە قاچیدا (۳) پەنجەی هەبووە.لە سەردەمی ئیوسینیدا ژیاوە |

| | | |
|---|---|---|
| هيروين = هيروئين | Heroine | هيروين، دهرمانێكی سڕكهری دهستكرده له مۆرفين يان تلياك دروست دهكرێت. |
| هيراسيوم، حشيشة الغراب | HawKs eye = HawKeed | گيايهكی دهشتهكیيه، قهدهكهی تووكنه گوڵهكهی زهرده يان پرتهقاڵیيه، رهگهكهی بۆ مهبهستی پزيشكی بهكاردێت. |
| هيسون = هيستريا | Hyson | (هايسۆن) چايیيهكی چينی سهوزه. |
| هيس - سلب - ويج | Plough beam | بهشێكه له گاسن. |
| هيستدين-سي | Histidine-c | هيستيدين س - دهرمانێكه بۆ چارهكردنی برينی گهده بهشێوهی دهرزی ههيه. |
| هيسبريدين | Hesperidin | (هێسـپێريدين)مادهيـهكی گلـو كۆسـيديه لـه لهزۆربـهی رووهكـه مزرهمهنیيهكاندا ههيه، به تايبهتی توێكڵی پرتهقاڵ. |
| هيستدين | Histidine | (هيستيدين) جۆرێكه له مادهی ترشی ئهمينی. |
| هيسبرونس | | جۆره باڵندهيهكی ئاوی قڕ تێكهوتووه، توانای فڕينی نهبووه. |
| هيستامين | Histamine | (هيستامين) دهرمانێكه كار دهكاته سهر كۆئهندامی دهماری. |
| هيشة | BraKe = Brambly ground | پێشهڵانی تووترك. |
| هيش - غابة - متلبدة - ديسة | Jungle | دارستانی چڕ، جهنگهڵستان. |
| هيص،هيض،ذرق | Dung | ريقنهی باڵنده كه بۆ پهيين باشه. |
| هيصة - ضجيج | Tumult = hurly burly | ههراو هوريا، دهنگه دهنگ. |
| هيصور | Sisor | ماسیيهكی دهريايیيه له كۆمهڵـهی مارماسی، لهشی لـه قامچی ئـهچێت، دوو سمێڵی ههيه كلكێكی باريكی زۆر درێژی ههيه. |
| هيصم | Alabster | ١)مهرمهر٢) جۆرێكه له گهچ له چينی سپی پێكهاتووه. |
| هيضة - هواء اصفر - كوليرا | Cholera | (كۆليرا) رشهوڕشانهوه، چاوهقووڵی، نهخۆشیيهكی ترسناكه. |
| هيضة الدجاج - كوليرا الدجاج | Cholera of Poultry = Fowl cholera | كۆلێرای مريشك. |
| هيضي | Choleric | كۆلێرايی ههرشتێك پهيوهندی به نهخۆشی كۆلێراوه ههبێت. |
| هيضمان - فجل الخيل | Hirse radish | تووره كێويله، تووری وولاغ-تووری ئهسپ، گيايهكی پزيشكیيه رهگهكهی ئهستوورو سپیيه، تامهكهی لـه تـامی خهرتهلـه ئهچێت، گوڵهكـهی وردو سپیيه، بهرهكهی له بهری خرنووك، ئهچێت باريكه، تۆوهكهی قاوهيیيه رۆنێكی تايبهتی لێ دهردههێنرێت. |
| هيطل | Fox | ڕێوی، ڕيڤی. |
| هيطلة - ناشط - ابو حراب - وضيحي- ابو سولع - قهة - بيسة - مارية | Oryx of nubia | مانگا كێوی سودانی. |
| هيعة - زعقة - صيحة | Yell = shriek | قيژه، هاوار. |
| هيف | Northeast wind, par ching wind | ١) جۆره بايهكی گهرمه ئهبێته هۆی ووشك كردنی رووهك و تينوكردنی گياندار. ٢) باريك بوونهوه. |
| هيفة - حبيكة - خيط فطري | Hypha | (هايفا) كۆمهڵێك دهزووی رووهكیيه رهنگـی سـهوزی تيادانيـه، پهيكـهری كهڕووی لێ پێك دێت. |
| هيفيا، شجرة المطاط | Hevea = cautchouc-tree = Para-rubber tree | (هيڤيا) درهختی لاستيك، درهختێكه به قلیشاندنهوهی توێكڵـی قهدهكهی ئاووكی لاستيك پهيدا دهبێت. |

| | | |
|---|---|---|
| هيكل معدني(السيارة) شاصي | Chassis | شاسی، پەیکەری ئۆتۆمۆبیل یان فڕۆکە. |
| هيكل - بناء عظيم | Alarge building | پەیکەر،ساختمان |
| هيكل - معبد | Temple | پەرستگە. |
| هيكل | FrameworK | پەیکەر، داربەند. |
| هيكل السرج | Saddle sKeleton | خوانی زین، ئەرفەزین، تەکەڵتو، عارەق گیر. |
| هيكل عظمي | Skeleton-system | پەیکەری ئێسکی، پەیکەری ئێسقانی. |
| هيكلي | SKeletal | پەیکەری ، هەرشتێك پەیوەندی بە پەیکەرەوە هەبێت. |
| هيكل محوري | Axial-sKeleton | پەیکەری تەوەرەیی، پەیکەری دووخی. |
| هيكل بلوري | Crysial sKeleton | پەیکەری کریستاڵی، ریزبوونی ئەتۆمەکانی یان ئایۆنەکانی مادەیەکی کیمیایی بەشێوەیەکی ئەندازیاری تایبەتی. |
| هيكل خارجي | ExosKeleton | پەیکەری دەرەکی. |
| هيكل داخلي | EndosKeletor | پەیکەری ناوەکی. |
| هيكروتون ريسربين | Hygro ton Reserpine | هایگرۆتۆن ریسەربین: دەرمانی رێکخستنی پەستانی خوێن. |
| هيكسان | Hexane | هێکزان، (هێکسان) گازێکی هایدرۆکاربۆنی‌یە لە شەش ئەتۆم کاربۆن و چواردە ئەتۆم هایدرۆجین پێکهاتووە. |
| هيكسوز | Hexose | هێکسۆز) شەکرێکی تاکی‌یە شەش ئەتۆم کاربۆن لە گەردیلەیەکدا هەیە. |
| هيكرومتر مرطاب | Hygrometer | ( (هایگرۆمەتر) شێ پێو، ئامرازی پێوانی شێ. |
| هيكل الباب أو الشباك | | شیپانە. |
| هيكروتون | Hygroton | (هایگرۆتۆن): دەرمانێکە بۆ میزپێکردن بەکاردێت بەشێوەی حەبە. |
| هيليكوبتر - طائرة حوامة أو عمودية | Helicopter | هەلیکۆپتەر، فڕۆکەی ستوونی ، جۆرێکە لە فڕۆکە دەتوانێت بخولێتەوە هەروەها بەشێوەیەکی ستوونی سەرکەوێت و داکەوێت. |
| هيل | | راجع (هال). |
| هيل وهيلمان | Heaps of money | پارەی زۆر. |
| هيليوم | Helium | (هیلیۆم) توخمێکی کیمیایی ناکانزایە، کێشی ئەتۆمی‌یەکەی (٤) و ژمارەی ئەتۆمی‌یەکەی (٢) بەشێوەی گازێکی بێ رەنگی یەك ئەتۆمی‌یە، ناسوتێت بە دەگمەن لە هەوادا هەیە، ئەکرێتە باڵۆنەوە بۆ مەبەستی سوك کردن و بەرزکردنەوە نیشانەکەی (He) یە. |
| هيليوديرما - هيلوديرما، هيلية، سحلية سامة | Heloderma = gila monster | (هێلۆ دێرما) جۆرە مارمێلکەیەکی ئەمریکی ژەهراوی ترسناکە درێژی‌یەکەی دەگاتە مەترێك، ددانەکانی ژەهراوین. |
| هيلغارديت | Hilgardite | (هیلگاردایت)، جۆرە مەعدەنێکە. |
| هيلونومس | Hylonomus | (هیلۆنۆمەس) گیاندارێکی خشۆکی دێرینە. |
| هيماتيني | Hematinic | (هیماتینیك) دەرمانێکە بڕی هیمۆگلۆبین لە خوێندا پتر دەکات. |
| هيميمورفيت | Hemimorphite | هێمیمۆرفایت، مەعدەنێکە بریتی‌یە لە سلیکاتی زینکی ئاویی، بەچەندرەنگێك هەیە،، بێ رەنگە، سپی، شینی کاڵ، مەیلەو سەوز، مەیلەو زەرد، قاوەیی، وەکوو کەرەسەیەکی خاوی زینك سوودی وەردەگیرێت. |
| هيموتوكسين - سم دموي | Hemo Toxin | هیمۆتۆکسین، هەر مادەیەك خانەکانی خوێن لەناو بەرێت بۆ نموونە ژەهری ماری کۆبرا. |

| | | |
|---|---|---|
| هيموفيليا - ناعور | Haemophilia | (هيمۆفيليا) خوێن پژانی زکماکی، نەخۆشی‌یەکی زکماکی‌یە، لە دایکەوە ئەچێت بۆ کوڕەکانی، ئەگەر خوێنی ئەو کوڕە بەربوو، زۆر بە زەحمەت ئەگیرسێتەوە. |
| هيمافيزاليس - حمن | Haemaphysallis | (هیمافیزالیس) جۆرە گەنەیەکە لەسەر لەشی گیانەوەرە ماڵی‌یەکان دەژی. |
| هيماتين | Hematin | (هیماتین) رەنگێکی سوورە لە خڕۆکە سوورەکانی لەشدا هەیە،لە شیبوونەوەی هیمۆگلۆبین پەیدا دەبێت. |
| هيموسيانين | Haemocyanin | (هیمۆسیانین) رەنگێکی شینە بریتی‌یە لە پرۆتینی مس لەخوێنی هەندێك لە گیاندارە نەرمەکان و جومگەدارەکاندا هەیە پەیوەندی هەیە بە هەناسەدانەوە. |
| هيمافيت | Hemavit | (هیماڤیت) دەرمانێکە بۆ چارەکردنی خوێن کەمی بەشێوەی گولاج هەیە. |
| هيماتتس | | گوڵە خوێن، جۆرە رووەکێکە ژەهری لێ دەرئەهێنرێت. |
| هيماتوبوسكة - شارب الدم | Haemato bosca | (هیماتۆبۆسکە) جۆرە مێشێکی گەزندەیە. |
| هيمنة - زعامة | Leadership | دەست بەسەرداگرتن، دەسەڵات، سەرکردایەتی. |
| هێمان | Over head and ears inlove | شەیدا،،ئاشق. |
| هيموكلوبين، هيموغلوبين | Haemoglobin | (هیمۆگلۆبین) مادەیەکی پرۆتینی سوورە لە خڕۆکە سورەکانی خوێندا هەیە، پەیوەندی هەیە بە گواستنەوەی ئۆکسجین و هەناسەدانەوە. |
| هيماتايت، حجر الدم، شاذنج | Haematite = Hematite | (هیماتایت) -بەردەخوێن، مادەیەکە رەنگەکەی سووری مەیلەو قاوەیی‌یە بریتی‌یە لە ئۆکسیدی ئاسنی سروشتی چەند جۆرێکی هەیە ناسراوە ترینیان (لیمۆنایت)، یەکێکە لە کەرەسە خاوەکانی ئاسن، لە بۆیەی سووریشدا بەکاردێت. |
| هيماليا | Himalia | (هیمالیا) پاشکۆی هەسارەی بەرجیسە دوریی لە ئەستێرەکەیەوە ($7125\times10^{3}$) میلە تیرەکەی ٦٠ میلە ، زانا پێرین لە ١٩٠٤دا دۆزی‌یەتیەوە. |
| هيموسيتوميتر | | دەزگایەکە رادەی سپێرمی لە ئاوی نێردا پێ ئەدۆزرێتەوە. |
| هێن = سهل | Easy = light | ئاسان، ساناهی. |
| هيولي - المادة الأولى | Primordial matter | مادەی یەکەم، مادەی سەرەتایی. |
| هيومايت | Humite | هیومایت، مەعدەنێکە مەگنیسیۆم و سلیکۆن و فلۆرۆ هایدرۆجین و ئۆکسجینی تیایە رەنگەکەی سپی ، زەردی کاڵ، قاوەیی‌یە. |
| هيوفاريقون - لوفاريقون - اندروسامن - عرن - روجة - رمان الأنهار | St.Johns wort = Tutsan = goat weed = triq uetrifolium | زورناتك-سورناتك-راشك، گوڵی سێرك(لەزاخۆ) گوڵە باروون، دەرمانە سوورە، تریتمە، گوڵ ئاجان، گیا بزنە. |
| هيولانديت | Heulandite | هیولاندایت، مەعدەنێکە بریتی‌یە لە سلیکاتی کالسیۆم و سۆدیۆم و ئەلەمنیۆمی ئاویی، بە رەنگی سپی، خۆڵەمێشی ، مێخەکی، سوور، مەیلەو قاوەیی هەیە. |
| هيوفاريقون - داذي رومي | Hupericum = stjohns wort Millepertuis = Rosin rose | گیابزنە، گیای سانت جۆن، گیایەکە یان دەوەنێکە گەڵاکانی بەرامبەر یەکن، گوڵەکەی زەردە بۆ مەبەستی پزیشکی بەکاردێت. |

